سەرچەمی پەیامەکانی نوور

١

# وتەکان

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

[illegible]

فارووق رەسوول یەحیا

کردوویە بە کوردی

سەرجەمی پەیامەکانی نوور

١

# وتەکان

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

داینــاوە

فاروق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

نورسی، سعید، ۱۸۷۳ - ۱۹۶۰م. Nawrasi, Said
وته کان / بدیع الزمان سەعیدی نوورسی؛ وەرگیر فاروق رسول یحیی.-- تهران: احسان، ۱۳۸۳.
[۱۰۱۰] ص.
ISBN: 964-356-363-4
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
کتابنامه: به صورت زیرنویس.
۱. اسلام -- تجدید حیات فکری. الف. یحیی، فاروق رسول، ۱۹۵۰ - م. مترجم.
ب. عنوان.
۲و۹ن/BP۲۳۳/۷/۰۹ ۲۹۷/۴۸
۱۳۸۳
کتابخانه ملی ایران ۸۳-۱۵۱۷۷م

## وته کان

✦مؤلف: بدیع‌الزمان سعید نورسی
✦مترجم: فاروق رسول یحیی
✦ناشر: نشر احسان
✦تیراژ: ۱۰۰۰ نسخه
✦نوبت چاپ: اول - ۸۳
✦چاپ: چاپخانه مهارت
✦قیمت: ۷۰۰۰ تومان

فروشگاه شمارهٔ ۱: تهران ـ خیابان انقلاب ـ روبروی دانشگاه ـ مجتمع فروزنده ـ شمارهٔ ۴۰۶ ـ تلفن: ۶۹۵۴۴۰۴
فروشگاه شمارهٔ ۲: تهران ـ خیابان ناصر خسرو ـ کوچه حاج نایب ـ شمارهٔ ۱/۱۱ ـ تلفن: ۳۹۰۲۷۵۰
صندوق پستی: تهران ۳۸۵ ـ ۱۱۴۹۵




ISBN: 964-356-363-4
شابک: ۹۶۴-۳۵۶-۳۶۳-۴

ژمارەی سپاردن
(۳٦) سالی (۲۰۰۵)

بسم الله الرحمن الرحيم

وبه نستعين

الحمد لله رب العالمين والصلوة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

ئەی کاکی برا!

داوای هەندێ ئامۆژگاریت لێ کردبووم. وا چەندڕاستییەکت پێشکەش دەکەم و، تۆیش لەگەڵ نەفسی مندا - کە لە هەموو کەسێك زیاتر پێویستی بە ئامۆژگارییە - گوێیان لێ ڕابگرە.

جا لەبەر ئەوەی تۆ لە سەربازیدایت، ئەوا ئەم ڕاستییانە لە ناوەندی چەند نموونەیەکی سەربازی و لە هەشت چیرۆکی کورتدا دەهێنمەوە کە کاتی خۆی هەشت وتەی دوور و درێژ بوون و لە هەشت ئایەتی پیرۆزەوە وەرم گرتبوون و ئاراستەی دەروونی خۆمم کردبوون. وا ئێستاش لەسەر زمانی زۆرینەی خەڵکی ئاراستەی دەروونی خۆمیان دەکەمەوە و، هەر کەسێکیش حەزیان پێ دەکات با لەگەڵ ئێمەدا گوێیان لێ ڕابگرێت.

# وتەی یەکەم

## بسم الله الرحـــمن الرحيم

"بسم الله..." سەرەتای هەموو کـارێکی خێر و گرنگـە، بۆیـە ئێمـەش لـە سـەرەتاوە باسـی دەکەین و بە "بسم الله" دەست پێ دەکەین.

بزانە ئەی نەفسەکەم!

ئەم وشە پاراوە پیرۆزە هەروەك دروشمی ئیسلامە، لە هەمان کـاتدا زیکـر و ویـردی هـەموو بوونەوەرانیشە بە زمانی حاڵیان.

ئەگەر دەتـەوێت تێ بگـەیت کـە چ هێزێکی گـەورە و بێ برانـەوە لـەم وشـەیەدا هەیـە و، بزانیت چ بەرەکەتێکی مەزن ونەبڕاوەی لـەخۆ گرتـووە، ئـەوا گـوێ بۆ ئـەم چیرۆکـە کورتـە رابگرە:

هەر دەشتەکییەك بیەوێت بەناو دەشت و دەر و بیاباندا بگەڕێت و بـە ئـازادی کارەکـانی جێبەجێ بکـات، دەبێ بۆ ئـەم مەبەستە پـەنا بەرێتـە بـەر هۆزێکـی ئـەو ناوچەیـە و نـاوی سەرگەورەی ئەو هۆزە بزانێت و پشتیان پێ ببەستێ، بۆ ئەوەی لە زیانی چەتـە و شـەڕفرۆش و رێگران پارێزراو بێت و پێویستییەکانی جێبەجێ بکات. خۆ ئەگەر ئەم کارە ئەنجام نـەدات، ئەوا بە تەنها دەست دەمێنێتەوە لە بەرامبەر چەندەها دوژمن و هەزاران پێویستیی ژیاندا.

جارێکیان دوو کەس بەرەو گەشتێکی وا کە باسمان کرد کەوتنە ڕێ. یەکێکیان مرۆڤێکی لەخۆبووردە بوو، بەڵام ئەوی دیکەیان سەرکەش و لەخۆباییی بوو.



یەکەمیان پەنای بردە بەر سـەرۆك هۆزێـك بـەڵام دووهـەمیان ئەمـەی نـەکرد و گوێـی پێ نەدا. ئیتر هەر یەکەیان بە لایەکدا ڕۆشتن.

یەکەمیان کە دەگەیشتە هەر جێیەك و دانیشتوانی ئەو ناوچەیـە کـە دەیـانزانی سـەر بـەو هۆزەیە، ڕێزێکـی زۆری لـێ دەگیرا و بـۆ خـۆی دەحەسایەوە، خۆ ئەگـەر یـەکێکی چەتـە و ڕێگری پێ بگەیشتایە، ئەوا دەستەڵات و هێزی ئەو خێڵە دەبوو بەهۆی ئەوەی دەست نەخرێتە ڕێی. بـەم شێوەیە و بەوپـەڕی ئـازادی و نەترسـانەوە گەشـتی خـۆی تـەواو کـرد و کارەکـانی بەجێ هێنا.

بەڵام کابرای سەرکەش و یاخی، ئەوەندە ناخۆشیی تووش بوو کە لە بـاس کـردن نایـەت. بە درێژایـی گەشـتەکەی لـە تـرس و بیـم و خەفـەت و سـوالکردندا بـوو. بـەو جـۆرە، خـۆی زەلیل و ڕسوا کرد.

ئەی نەفسی سەرکەشی یاخیبووم!
چاك بزانە کە تۆ ئەو ڕێبوارەیت..
ئەو بیابانە پڕ لە مەترسییەش ئەم دنیایەیە..
هەروەها باش بزانە کە "هەژاری" و "بێ دەستەڵاتی"ی تۆ سنووریان نییە و دوژمنەکانت تابڵێی زۆرن و پێویستییەکانی ژیانیشت لەبن نایەن.
کەواتە پەنا بەرە بۆ خاوەنی ڕاستەقینە و کاربەدەستی هەتاهەتایی ئەم دەشت و بیابانە، بۆ ئەوەی دوور بیت لە سەرشۆڕی و پاڕانەوە بەرامبەر بوونەوەران و ترست لە هیچ ڕووداوێکی سامناك نەبێت لە ڕێگاتدا.
بەڵێ، وتەی: "بسم الله" گەنجینەیەکی گەورەی وایە کە "هەژاری" و "بێ دەستەڵاتی"ی مرۆڤ بە میهرەبانییەکی گەورە و دەستەڵاتێکی هێندە نەبڕاوە و بێ کۆتاییەوە پەیوەست دەکات کە جڵەوی بوونەوەرانی هەر لە گەردیلەکانەوە تا گەلەستێرەکان لە دەستدایە. بە شێوەیەك کە ئەو "هەژاری" و "بێ دەستەڵاتی"یەی مرۆڤ دەگەیەنێتە پلەیەك کە دەبن بە تکاکار و، نزا و پاڕانەوەیان لە دەرگانەی خواوەندی بە دەستەڵات و میهرەبان و شکۆمەندا گیرا دەکات.
بەڵێ، هەر کەسێ هەڵسوکەوت و کاروباری شەو و ڕۆژی "بە ناوی خوا"وە ببات بەڕێوە، وەکو سەربازێك وایە کە هەموو کاروبار و هەڵسوکەوتێکی بە ناوی یاسا و دەوڵەتەوە ئەنجام بدات و بەو هۆیەوە بەرەوڕووی هەموو مەترسییەك ڕابووەستێت، چونکە بە ناوی یاسا و دەوڵەتەوە دەدوێت و کارەکانی ئەنجام دەدات.
لە سەرەتاوە وتمان: هەموو بوونەوەران بە زمانی حاڵیان دەڵێن: "بسم الله". ئایا ڕاستە وایە؟
بەڵێ، گومانی تێدا نییە کە ئەگەر تۆ کەسێکت بینی خەڵکی دەدایەبەر و دەیبردن بۆ معیدانێك و هەندێ کاروباری جۆراوجۆری پێ جێبەجێ دەکردن، یەکسەر بۆت ڕوون دەبێتەوە کە ئەو کەسە بە ناوی خۆیەوە ئەم کارانە ناکات و توانای زۆرکردنی لەو هەموو خەڵکە نییە، بەڵکو سەرباز و فەرمانبەرێکی دەوڵەتە و بەهۆی هێز و دەستەڵاتی دەوڵەت و بە ناوی یاساوە ئەو کارانە جێبەجێ دەکات و پشت بە پادشا و فەرمانڕەوایەك دەبەستێت.
هەروەها هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا کارەکانیان "بە ناوی خوا"وە جێبەجێ دەکەن، تەنانەت بچووکترین تۆوی درەخت، بە "ناوی خوا"وە چەندەها درەختی گەورە و کۆڵی قورس لەسەر سەریان هەڵدەگرن..
هەروەها هەر درەختێك کە "ناوی خوا" دەبات، دەستەکانی لە میوەی زۆر و ڕازاوەی گەنجینەی بەزەیی و میهرەبانیی خوای گەورە پڕ دەکات و، بەوپەڕی ئاسایی و ڕێزەوە پێشکەشمانی دەکات..

هه‌روه‌ها ڕه‌ز و باخ و بێستانه‌كانیش كه‌ "ناوی خوا" ده‌به‌ن و په‌نا ده‌به‌نه‌ به‌ر ده‌سته‌ڵاتی بێ سنوور و نه‌بڕاوه‌ی خوای گه‌وره‌، ئه‌وا خوارده‌مه‌نیی جۆراوجۆر و به‌تام و له‌زه‌تیان تێدا پێ ده‌گات..

هه‌روه‌ها ئه‌و ئاژه‌ڵه‌ به‌پیت و پڕ سوودانه‌ی وه‌ك: بزن و مه‌ڕ و مانگا و حوشتر، هه‌ر یه‌كه‌یان كه‌ "ناوی خوا" ده‌بات، گوانی ده‌بێته‌ كانییه‌ك و شیری لێ هه‌ڵده‌قوڵێت. به‌م چه‌شنه‌ و به‌ "ناوی ڕۆزیده‌ر"ه‌وه‌ خاوێنترین و باشترین خۆراكمان پێشكه‌ش ده‌كات..

هه‌روه‌ها ڕه‌گ و بنه‌چه‌ی هه‌ر ڕووه‌ك و دره‌خت و گیایه‌ك به‌: "ناوهێنانی خوا" به‌ردی ڕه‌ق و ته‌ق ده‌سمێت و به‌ تاڵه‌ مووه‌ ئاوریشمییه‌كانی كونی ده‌كات! به‌م جۆره‌ و "به‌ ناوی خوای میهره‌بان"ه‌وه‌ هه‌موو كارێكی گرنگ و هه‌موو شتێكی گرانی له‌ ڕێدا بۆ ئاسان ده‌بێت.

بەڵێ، كاتێ كه‌ دره‌خت لق و په‌له‌كانی له‌ناو هه‌وادا بڵاو ده‌كاته‌وه‌ و به‌روبوومه‌كانیان له‌سه‌ر هه‌ڵده‌گرێت.. كاتێ جێی لق و په‌لی ڕه‌گه‌كانی له‌ناو به‌ردی ڕه‌ق و ته‌قدا ده‌كاته‌وه‌ تاكو ئه‌و ڕه‌گانه‌ خۆراكی پڕسوود له‌ناو چینه‌كانی زه‌ویدا كۆ بكه‌نه‌وه‌.. كاتێ گه‌ڵای ته‌ڕی دره‌خت ده‌توانێت به‌رامبه‌ر گڕه‌ی گه‌رما خۆی ڕابگرێت و بمێنێته‌وه‌..

هه‌موو ئه‌مانه‌ و جۆره‌هاى ترى وه‌ك ئه‌مانه‌ش، زلله‌یه‌كی توند و تیژن به‌سه‌ر ده‌موچلی ماددییه‌ هۆپه‌رسته‌كان و هاوارێكی گه‌وره‌یه‌ له‌ دژیان و په‌نجه‌ به‌ چاویاندا ده‌كات و ده‌ڵێت: ڕه‌قیی ئه‌و به‌ردانه‌ و گڕه‌ی به‌هێزی ئه‌و گه‌رمایه‌ به‌ سه‌ربه‌خۆیی و ئاره‌زووی خۆیان كار ناكه‌ن، به‌ڵكو هه‌موویان فه‌رمانی خوایه‌كی ته‌نیای دانا و زانا جێبه‌جێ ده‌كه‌ن، به‌ شێوه‌یه‌ك ڕه‌گه‌ ورده‌ ئاوریشمییه‌كان وه‌ك: "عه‌سای مووسا" به‌رده‌ ڕه‌قه‌كان له‌ت ده‌كه‌ن و فه‌رمانی: ﴿فَقُلْنا اضْرِبْ بعصاكَ الْحَجَرَ﴾ (البقرة: ٦٠) جێبه‌جێ ده‌كه‌ن.. هه‌روه‌ها گه‌ڵای ته‌ڕی دره‌خته‌كانیش وه‌كو ئه‌ندامه‌كانی ئیبراهیم پێغه‌مبه‌ر - دروودی خوای له‌سه‌ر بێت - ئایه‌تی: ﴿يا نارُ كُونِي بَرْداً وسَلاماً﴾ (الأنبياء: ٦٩) ده‌خوێنن!

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ هه‌موو شتێك له‌ بوونه‌وه‌ردا به‌ زمانی حاڵ ده‌ڵێت: "بسم الله" و، ئه‌مه‌شی بۆ ده‌بێت به‌هۆی ده‌ستكه‌وتنی جۆره‌ها نیعمه‌ت و پێشكه‌ش كردنی به‌ بوونه‌وه‌رانی تر، ئه‌وا ده‌بێ ئێمه‌ش هه‌موو كارێكمان "به‌ ناوی خوا"وه‌ بێت:

به‌خشینمان "به‌ ناوی خوا"وه‌ بێت..

وه‌رگرتنمان "به‌ ناوی خوا"وه‌ بێت..

هه‌روه‌ها "به‌ ناوی خوا"وه‌ ده‌ستی له‌خوا بێ ئاگایان بگێڕینه‌ دواوه‌ و لێیان وه‌رنه‌گرین كاتێ كه‌ "به‌ ناوی خوا"وه‌ شتمان نابه‌خشن!

**پرسیار:**

هەر کەسێك کە دەبێت بە هۆکاری ئەوەی نیعمەتێکمان دەست بکەوێت، هەردەم لە پاداشتیدا ڕێزی لێ دەگرین. ئەی ئایا خاوەنی ڕاستەقینەی ئەم هەموو نیعمەت و ڕۆزییە زۆرانە چیمان لێ داوا دەکات؟

**وەڵام:**

ئەو نیعمەت بەخشە ڕاستەقینەیە لە بەرامبەر ئەم هەموو جۆرە نیعمەت و ڕۆزییە زۆرانەوە، داوای سێ شتمان لێ دەکات:

یەکەم: یاد و ناوی خوا بردن (الذکر).. دووهەم: شوکر و ستایش (الشـــکر).. سێهەم: بیرکردنەوە لە گەورەیی ئەو خوایە (الفکر)..

کە لە سەرەتاوە "بسم الله" دەکەین، ئەمە "زیکر"ە..

کە لە کۆتاییدا "الحمدلله" دەکەین، ئەمە "شوکر"ە..

کە لە نێوان "بسم الله" و "الحمد لله"شدا بیر لە دەستەڵات و موعجیزەی خوای میهرەبان دەکەینەوە لەو نیعمەتانەی کە هەر یەکەیان موعجیزەیەکی توانستی خوای تاك و بێ وێنەیە و، دیارییەکە لە دیارییەکانی میهرەبانیی فراوانی ئەو خوایە.. کاتێ بیر لەمانە دەکەینەوە، ئەمە "فیکر"ە.

بەڵام ئایا ئەو کەسەی کە دیارییەکی پادشای بە سەربازێکیدا بۆ هاتووە چەندە بە بێعەقڵ و نەفام دادەنرێت گەر لە بریی سوپاسی پادشا، پێڵاوی ئەو سەربازە ماچ بکات؟

ئایا ئەو کەسەی کە هەمیشە لە شان و باڵی "هۆکارەکان" دەخوێنێت و تەنها ئەو هۆکارانەی خۆش دەوێت، نەك نیعمەتدەر و ڕۆزی بەخشی ڕاستەقینە، هەزار هێندەی ئەو کابرایە گەوج و گەلحۆتر نییە؟!

دەسا ئەی نەفسەکەم!

ئەگەر ئامادە نییت و ناتەوێ وەك ئەو مرۆڤە گێل و گەلحۆیە بیت..

ئەوا:

"بە ناوی خوا"وە ببەخشە..

"بە ناوی خوا"وە وەربگرە..

"بە ناوی خوا"وە دەست بە هەموو کارێك بکە..

"بە ناوی خوا"وە کارەکانت بەجێ بهێنە.

والسلام.

# وتەی دووهەم

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿الَّذين يؤمِنونَ بالغَيبِ﴾ (البقرة:٣)

ئەگەر دەتەوێت بزانیت "ئیمان" تا چ ڕادەیەك بەختیاری و نیعمەتێکی گەورەیە و، تاچ ئەندازەیەکیش لەزەت و حەسانەوە بە مرۆڤ دەبەخشێت، ئەوا گوێ بۆ ئەم کورتە چیرۆکە ڕابگرە:

ڕۆژێکیان دوو پیاو بە مەبەستی حەوانەوە و بازرگانی پێکەوە ڕۆشتن بۆ گەشتێك، یەکێکیان - کە مرۆڤێکی خۆپەرست و بەدبەخت بوو - ڕووی کردە لایەك و، ئەوی تریشیان - کە مرۆڤێکی خواپەرست و بەختەوەر بوو - ڕووی کردە لایەکی تر.. بەم جۆرە، هەریەکەیان ڕێی خۆی گرتەبەر.

خۆپەرستە لە خۆبایی‌یەکەیان کە مرۆڤێکی ڕەشبین بوو، لە سزای ڕەشبینی‌یەکەی‌دا دووچاری وڵاتێك بوو کە لەبەرچاوی‌دا لە ڕادەبەدەر خراپ وشووم بوو؛ ڕووی دەکردە هەر گۆشە و قوژبنێك مرۆڤی بێچارە و بێ دەستەڵاتی دەبینی کە هاواریان دەکرد و لە دەست کەسانی دڵڕەق و بێ بەزەیی و کارە ڕووخێنەرەکانیان دەیانناڵاند.. دەڕۆشتە هەر جێگایەك خەم و پەژارەی بەرچاو دەکەوت، بە ڕادەیەك ئەو وڵاتە لە پێش‌چاوی‌دا شێوەی ماتەمینگایەکی گشتیی وەرگرتبوو! جا بۆ ئەوەی ئەم مەینەتی‌یەی کەم بکاتەوە و لە بیری خۆی بەرێتەوە، هیچ چارەیەکی نەدۆزی‌یەوە جگە لە خۆ مەستکردن. چونکە وا گومانی دەبرد کە هەموو دانیشتووانی ئەم وڵاتە دوژمنایەتیی دەکەن و ڕقیان لێیەتی و سەبارەت بەم کەسانێکی نامۆن، ئەوەش کە زیاتر بوو بە مایەی ئەوەی ویژدانی ئەم مرۆڤە لە ئازاردا بتلێتەوە ئەوە بوو کە بە هەر لایەکدا دەیڕوانی و سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد، چەندین تەرمی سامناکی دەهاتە پێش چاو، هەروەك گوێی لە دەنگی ناڵە و شیوەنی هەتیوان دەبوو کە بە نائومێدی‌یەوە دەگریان.

بەڵام ئەوی تریان کە خواپەرست و عەودالی حەق و ڕاستی و خاوەنی ڕەوشتی بەرز و پەسەند بوو، تووشی وڵاتێك بوو کە لە پێش چاوی‌دا خۆش و دڵڕفێن بوو. هەر کە گەیشتە ئەوێ بینیی وا ئاهەنگ و شادی ساز کراوە و، لە هەموو لایەکەوە شادمانی‌یە و لە هەر

گۆشەیەکدا خۆشییە و لە هەر جێگایەکدا میحرابی زیکرە، بە ئەندازەیەکی ئەوتۆ دڵی بەم دیمەنانە گەشایەوە کە هەموو دانیشتووانی وڵاتی بە دۆست و هاورێی دڵسۆز و خزمی خۆشەویست دەهاتە پێش چاو. پاشان دەبینێ کە سەرانسەری وڵات لە ئاهەنگی پشوودا‌ندا شوکر و سوپاس و شادمانی و بەختەوەریی خۆیانیان ڕادەگەیاند و، گوێی لە ئاهەنگی تیپی مۆسیقا بوو کە بە ئاوازی پڕ لە جۆش و حەماسەتەوە خەڵکی دەخرۆشاند و هەڵی دەنان کە بە تەکبیر و تەهلیلەوە بەرەو جیهاد و خزمەتگوزاری بڕۆن.

لە کاتێکدا کە بەدبەختەکەیان بە پەژارەی خۆی و ئازاری خەڵکییەوە دەتلایەوە، کەچی ئەم بەختەوەرە، بە شادمانیی خەڵکی دڵخۆش و شادمان بوو. سەرەڕای ئەمەش بازرگانییەکی بەپیت و بەرەکەتی کرد و شوکرانەی خوای میهرەبانیشی بەجێ هێنا.

لە گەڕانەوەیدا هاورێکەی بینی و هەواڵی لێ پرسی. کە لە وەڵامی هاورێکەیەوە هەموو شتێکی بۆ دەرکەوت، ڕووی تێ کرد و پێی وت:

- (برام! تۆ دەڵێیت چی؟ ئایا شێت بوویت و ژیریت لە دەست داوە؟! تەنها ئەنجامی ڕەنگدانەوەی ڕەشبینیی دەروونتە کە لە ڕواڵەتتدا بەرجەستە بووە و، هەموو خەندەیەك بە شیوەن دێتە بەرچاوت و، هەر پشوودان و مۆڵەتێکیش بە تاڵان و برین دەزانیت! وەرەوە سەر هۆشی خۆت و دڵت لە هەموو ژەنگێك پاك بکەرەوە، تاکو ئەم پەردە تاریکەی سەر چاوانت لابچێت و بە ڕوونی ڕاستی ببینیت. ئەوەش بزانە کە پادشا و خاوەنی ئەم وڵاتە لەوپەڕی پلەی دادپەروەری و بەخشندەیی و توانا و پەروەردگاری و بەزەییدایە.. جا وڵاتێك بەم چەشنە لە بەرزی و پەرەسەندندا بێت - کە شوێنەواری ئەمانەش بە ئاشکرا دەبینرێن - هەرگیز بەو جۆرە نابێت کە وەهم و ئەندێشەی تۆ پیشانی دەدات)!

برادەرەکەشی کە ئەمانەی لێ بیست و وردە وردە هۆش و بیری خۆی خستەکار و هاتەوە سەر خۆی، بە پەشیمانییەوە وتی:

- بەڵێ ڕاستە، بەهۆی سەروسەودای زۆرم لەگەڵ مەیدا تێك چووبووم. خوا لێت ڕازی بێت، لە بارێکی پەرێشانی دۆزەخ ئاسادا بووم، ڕزگارت کردم.

* * *

ئەی نەفسەکەم!

باش بزانە کە پیاوی یەکەم: مرۆڤی "کافر" یاخود "فاسق"ی لەخوا بێئاگایە. ئەم دنیایە لە ڕوانگەی بینینی ئەودا ماتەمینگایەکی گشتییە و، سەرجەمی زیندەوەرانیش وەکو هەتیو وان و، هەمیشە لە دەست جودایی و لێکدابڕان لەناڵە و گریاندان..

لەم ڕوانگەیەوە ئادەمیزاد و گشت زیندەوەران بێ خاوەن دێنە بەرچاو و، بە نینۆکی ئەجەل شپرزە و لەت لەت دەکرێن و، چیا و دەریا و بوونەوەرە مەزنەکانی تریش وەك تەرمی ترسناکی بێ گیان و هەست دەردەکەون.

ئەم جۆرە کوفر و گومڕایییانەی کە مرۆڤ دەتوێننەوە، چەندین پەژارە و سەرسامییان لێ پەیدا دەبێت و، ئازارێکی تاڵی مەعنەویش دەرخواردی خاوەنەکەیان دەدەن.

پیاوی دووهەمیش: مرۆڤی "باوەڕدار"ە، کە بەدیهێنەر و خوای خۆی دەناسێت و باوەڕی پێیەتی. ئیتر "دنیا" لە ڕوانینی ئەودا بریتییە لە: زیکرگایەکی خوایی و، گۆڕەپانی مەشق و فێرکردن بۆ مرۆڤ و زیندەوەران و، کۆڕی تاقیکردنەوەی "جینی" و "ئادەمیزاد"ە..

مردنی مرۆڤ و زیندەوەران لەو گۆشە نیگایەوە بریتییە لە: پشوودانی پاش تەواو کردنی ئەرکی ژیان. ئەو باوەڕدارانەی کە ئەرکی سەرشانیان کۆتایی پێ هێناوە، شادمانن بە مالئاوایی کردنیان لەم دنیا فانییە و گواستنەوەیان بۆ جیهانێکی تری پڕ لە ئارامی و هێمنی، تاکو دەرفەت و ماوە فراوان و ئامادە بێت بۆ کارمەندانی نوێ کە ئەرکی خۆیان وەربگرن و ئەوانیش هەوڵی خۆیانی تێدا بدەن..

لەم ڕوانگەیەوە هاتنە دنیای ئادەمیزاد و زیندەوەران بریتییە لە: ڕەوانەکردنیان بۆ سەربازی و چەك وەرگرتن و خزمەتگوزاری، چونکە زیندەوەران سەربازی شادمان و دڵخۆشن و، فەرمانبەری ڕێکوپێك و شوکرانەبژێری خواوەندن..

ئەو دەنگ و زایەڵانەش کە لە هەموو گۆشە و کەنارێکی دنیاوە دێنە گوێ، یان زیکر و تەسبیحی وەرگرتنی ئەرك و فەرمانن، یا شوکر و ستایشی تەواو کردنی ئەو ئەرك و فەرمانانەیە کە پێیان سپێرراون، یاخود ئاوازێکە لە شەوق و شادمانیی کارکردندا بەرز دەبێتەوە.

کەواتە بوونەوەران، لە ڕوانگەی بینینی ئەم مرۆڤە باوەڕدارەوە، بریتین لە: خزمەتگوزاری دڵدەرەوە و، فەرمانبەری هاوڕێ و، پەڕاو و پەرتووکی شیرین و خۆشی خاوەنە بەخشندە و میهرەبانەکەیان.

بەم جۆرە، زۆر لەم چەشنە ڕاستییە بەرز و شیرین و بەتام و چێژانە لە "ئیمان"ی ئەو ئیماندارەدا دەردەکەون و دەدرەوشێنەوە.

کەواتە لە ڕاستیدا "ئیمان" تۆوی مەعنەویی: "تووبای بەهەشت" لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت و، "کوفر"یش تۆوی مەعنەویی: "زەقوومی دۆزەخ" لە خۆیدا دەشارێتەوە.

کەواتە، ئاسایش و سەرفرازی تەنها لە ئیسلام و ئیماندایە. لەبەر ئەوە، پێویستە هەمیشە پڕ بە دەم بڵێین:

"الحمدُ للهِ على دينِ الإسلامِ وكمالِ الإيمان".

# وتەی سێهەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿يا أَيُّهاَ الناسُ اعْبُدُوا﴾ (البقرة:٢١)

ئەگەر دەتەوێت بزانیت کە "خواپەرستی" چەندە بەختیاری و بازرگانییەکی گەورە و گرنگە و، خراپکاری و گومڕاییش چەندە زەرەر و زیانێکی گەورەی تێدایە، ئەوا سەیری ئەم چیرۆکە بکە و گوێی بۆ ڕابگرە:

جارێکیان دوو سەرباز فەرمانیان پێ درا کە بڕۆن بۆ شارێکی دوور. ئەوانیش پێکەوە کەوتنەڕێ هەتا گەیشتنە دووڕیانێك. لەوێدا پیاوێکیان دی، ئەم پیاوە پێی وتن:

(ڕێگای دەستە ڕاستیان سەرەڕای ئەوەی بێ زیانە، ئەوانەش کە دەیگرنە بەر بە ڕێژەی "نۆ لە دە" قازانجیان دەست دەکەوێت و بە ئارامی و بێ ماندووبوونیش دەیبڕن تا دەگەنە جێ. بەڵام ڕێگای دەستە چەپیان سەرەڕای ئەوەی هیچ دەسکەوتێکی تێدا نییە، "نۆ لە دە"ی ئەوانەش کە دەیگرنەبەر تووشی زەرەر و زیان دێن.. ئەوەش بزانن کە هەردوو ڕێگاکە بە ئەندازەی یەك دوورن، ئەوەندە هەیە ڕێگای دەستە چەپ، لەبەر ئەوەی پەیوەستی هیچ ڕژێم و یاسا و حکوومەتێك نییە، ئەو ڕێبوارەی پیایدا دەڕوات چەك و تفاق لەگەڵ خۆیدا هەڵناگرێت و، بەم پێیە سووکی و حەسانەوەیەکی ڕواڵەتیی تێدا دەبینێت. بەڵام ڕێگای دەستە ڕاست، لەبەر ئەوەی لە ژێر سایەی یاسادایە، ئەوا ئەو ڕێبوارەی کە بە سەربازی دەیگرێتەبەر ناچارە چەکێکی ڕەسمی بە قورسیی دوو کیلۆ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت و، تێکەی چوار کیلۆ خۆراکیش بخاتە ناو هەگبەکەیەوە، تاکو بتوانێت بەسەر هەر مەترسی و کۆسپ و دوژمنێکدا - کە لەوانەیە بێنە ڕێی - سەربکەوێت).

پاش ئەوەی ئەم دوو سەربازە گوێیان لە وتەی ئەو ڕابەرە شارەزایە ڕاگرت، بەختەوەرەکەیان ڕێی ڕاستی هەڵبژارد. بەم چەشنە کۆڵێکی قورسی بە کێشی یەك باتمان خستە ئەستۆی خۆیەوە، بەڵام "دڵ" و "گیان"ی لە منەت و ترس و ئازارێکی ئەوتۆ ڕزگاریان بوو کە بە هەزاران جاریش لەو کۆڵە قورستر بوو..

كه‌چی به‌دبه‌خته‌كه‌یان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی حه‌زی له‌ په‌یڕه‌وی كردنی یاسا نه‌بوو، ده‌ستی له‌ سه‌ربازی هه‌ڵگرت و ڕێگای چه‌پی هه‌ڵبژارد. خۆ هه‌رچه‌نده‌ش به‌ ڕواڵه‌ت له‌ هه‌ڵگرتنی ئه‌و كۆڵه‌ قورسه‌ ڕزگاری بوو بوو، به‌ڵام "دڵ و ده‌روون"ی كه‌وتبوونه‌ ژێر منه‌ت و ئازارێكی ئه‌وه‌نده‌ قورسه‌وه‌ كه‌ به‌ هه‌زاران جار له‌ هه‌ڵگرتنی ئه‌و كۆڵه‌ قورستر بوو.. "گیان"یشی هه‌رده‌م له‌ ترس و بیمدا ده‌یناڵاند و، هه‌ر كه‌سێكی له‌ ڕێگادا ده‌بینی ده‌ستی لێ پان ده‌كرده‌وه‌ و، له‌ گشت هه‌ڵوێست و ڕووداوێكی ڕێگادا ترسی لێ ده‌نیشت! هه‌ر به‌م جۆره‌ ڕێی بری هه‌تا ڕۆشته‌ جێی مه‌به‌ست و، له‌وێ به‌ سزای یاخی بوون و هه‌ڵهاتنی خۆی گه‌یشت.

ئه‌وی تریشیان كه‌ ڕێی ڕاستی گرته‌ به‌ر و په‌یڕه‌وی ڕێبازی سه‌ربازیی كرد و چه‌ك و كه‌ره‌سه‌ی خۆی پاراست، به‌ دڵێكی پڕ له‌ ئارامی و ده‌روونێكی پڕ له‌ هێمنی‌یه‌وه‌ ڕێگای بڕی تا گه‌یشته‌ جێگای مه‌به‌ست، بێ ئه‌وه‌ی ئاوڕ له‌ كه‌س بداته‌وه‌ و منه‌تی كه‌س هه‌ڵبگرێت، یاخود له‌ هیچ كه‌سێك بترسێت. ئیتر له‌وێ - وه‌ك هه‌ر كه‌سێك كه‌ ئه‌ركی سه‌رشانی ئه‌نجام دابێت - پاداشت و خه‌ڵاتی شایانی خۆی وه‌رگرت.

* * *

ئه‌ی ده‌روونی سه‌ركه‌شم!

بزانه‌ ئه‌و دوو ڕێبواره‌: یه‌كه‌میان ملكه‌چ و فه‌رمانبه‌ردارانی یاسای خواوه‌ندن.. مه‌به‌ست له‌وی تریشیان ئه‌وانه‌ن كه‌ یاخی بوون و، شوێنی نه‌فس و ئاره‌زووی ده‌روونی خۆیان كه‌وتوون.

ئه‌و ڕێگایه‌ش: ڕێی ژیانه‌ كه‌ له‌ "جیهانی گیان"ه‌وه‌ ده‌ست پێ ده‌كات و له‌ گۆڕه‌وه‌ تێپه‌ڕ ده‌بێت و له‌ جیهانی ئه‌ودنیا كۆتایی پێ دێت.

ئه‌و چه‌ك و هه‌گبه‌ و تفاقه‌ش بریتین له‌: ته‌قوا و په‌رستش، چونكه‌ په‌رستش هه‌رچه‌ند له‌ ڕواڵه‌تدا ئه‌ركێكی قورس و گران بێت، به‌ڵام له‌ ڕاستی‌دا ئاسانی و حه‌سانه‌وه‌یه‌كی ئه‌وتۆی تێدایه‌ كه‌ له‌ باسكردن نایه‌ت، چونكه‌ مرۆڤی خواپه‌رست له‌ نوێژه‌كه‌ی‌دا "یه‌كتایی" خوا ده‌رده‌بڕێت و ده‌ڵێت: "أشـــهد أن لا إلـــه إلاّ الله". واته‌: جگه‌ له‌ خوا هیچ به‌دیهێنه‌ر و ڕۆزیده‌رێك نی‌یه‌ و، هه‌موو سوود و زیانێكیش ته‌نها به‌ ده‌ستی ئه‌وه‌. خوایه‌كی دانایه‌ و هیچ شتێك به‌ هه‌ڕه‌مه‌كی و بێ واتا و مه‌به‌ست ناكات، هه‌روه‌ك به‌خشنده‌ و میهره‌بانه‌ و چاكه‌ و میهره‌بانی‌یه‌كانیشی تابڵێی گه‌وره‌ و زۆر و فراوانن..

مرۆڤی باوەڕدار باوەڕی بەو گوفتارانەی خۆی هەیە کە ڕایاندەگەیەنێت، بۆیە لە هەموو ساتێکدا دەرگانەی گەنجینەی میهرەبانی و بەخشندەیی خوا دەبینێت و، دەزانێت کە هەرچی هەیە لە ژێر دەستەلاّتی خوای پەروەردگاردایە. لەبەر ئەوە، هەردەم بە نزا و پاڕانەوە لە دەرگانەی ئەو گەنجینانە دەدات و، لە بەردەم هەموو گیروگرفتێکی دنیاشدا دەڕواتە ناو سەنگەری تەوەککولەوە و پشت بە پەروەردگاری خۆی دەبەستێت.

بەم چەشنە، مرۆڤی باوەڕدار لە ڕێگای "ئیمان"ەوە دڵنیایی و ئارامی و ئاسایشێکی تەواوی دەستگیر دەبێت.

یەعنی، ئازایەتی و نەترسان، وەك هەموو کردەوەیەکی تری چاك، تەنها لە سەرچاوەی ئیمان و پەرستشەوە سەرچاوە دەگرن. ترس و بیم و هەر کردەوەیەکی تری خراپیش تەنها لە گومڕایی و کوفرەوە پەیدا دەبن.

خۆ ئەگەر گۆی زەوی بۆمبایەك بێت و بتەقێتەوە، لەوانەیە مرۆڤی خواپەرستی دڵ ڕووناك نەترسێنێت و، بە موعجیزەیەکی دەستەلاّتی پەروەردگاری بزانێت و بە ڕێز و سەرسووڕمان و چێژەوە لێی ورد ببێتەوە..

بەلاّم مرۆڤی فاسقی دڵ مردوو با فەیلەسووفیش بێت - کە بە خاوەن عەقڵ و ژیریی زیاد دادەنرێت - لەوانەیە گەر ئەستێرەیەکی کلکدار(مُذَنَّب) لە ئاسماندا ببینێت ئەم لەسەر زەوییەوە سامی لێ بنیشێت و بلێت:

"ئایا بلێی ئەم ئەستێرەیە خۆی بە زەویدا بکێشێت"؟

(شەوێك دانیشتووانی ئەمریکا کلکدارێکیان لە ئاسماندا بینی، لە تاوا سامیان لێ نیشت و، هەندێکیشیان هەر بەو شەوە خانووەکانیان چۆڵ کرد)!

بەڵێ، گومان لەوەدا نییە کە "پێویستییەکان"ی مرۆڤ لە ڕادە بەدەرن، کەچی "سەرمایەکەی دەستی" ئەوەندە کەمە لە حوکمی "نەبوو"دایە.. هەروەها ئەو "بەلاّ و ناخۆشی"یانەی لە ژیاندا دێنە ڕێی یەکجار زۆرن، کەچی "توانا و دەستەلاّت"ی هێندە لاوازە وەك "نەبوو" وایە. واتە: مەودای بازنەی سەرمایە و دەستەلاّتی مرۆڤ هەر ئەوەندەیە کە دەستی پێی دەگات، بەلاّم بازنەی هیوا و ئاوات و، بازنەی بەلاّ و ئازارەکانی لەو مەودایەدان کە چاوی بڕ دەکات و ئەندێشە و خەیاڵی بۆی دەچێت!

لەم بەراوردەوە بۆمان دەردەکەوێت:

"گیان"ی مرۆڤ، کە تا ئەم ڕادەیە لاواز و بێ دەستەلاّت و هەژارە، چەندە پێویستی بە ڕاستییەکانی ئیمان هەیە، وەك: پەرستش و تەوحید و ملکەچ کردن بۆ فەرمانەکانی خوا و

پشت بەستن پێی. هەروەها بۆمان دەردەكەوێت كە هەر كەسێك ئەم ڕێگایە دەگرێتەبەر بەختیاری و نیعمەت و قازانجێكی یەكجار زۆر و گەورەی دەستگیر دەبێت. خۆ ئەگەر بینایی دڵی لە دەست نەدابێت، بۆ خۆی هەستیان پێ دەكات.

وەك ئاشكرایە هەر ڕێگایەك بێ زیان بێت، با ڕێژەی قازانجیشی یەك لە دە بێت، لە هەر ڕێگایەكی زیانبەخش باشترە. خۆ ئەم ڕێگایەی لەم مەسەلەیەدا مەبەستمانە ڕێی بەندایەتی و پەرستنی خوایە، كە سەرەڕای ئەوەی هیچ زیانێكی نییە و ڕێژەی قازانجیشی "نۆ لە دە"یە، لە هەمان كاتیشدا گەنجینەی كامەرانیی هەمیشەییمان پێ دەبەخشێت..

بەڵام ڕێی خراپەكاری، سەرەڕای ئەوەی بێ سوودە - هەروەك ڕێڕەوانی دان بەم ڕاستییەدا دەنێن - هۆیشە بۆ چارەڕەشی و لەناوچوونی هەمیشەیی. جگە لەوەی كە هیچ گومانێك لە زەرەر و زیانیدا نییە كە ڕێژەی دەگاتە "نۆ لە دە".

ئەم ڕاستییەش بە شایەتیی ژمارەیەكی زۆر لە چەسپێنەران و پسپۆڕانی ئەم مەیدانە چەسپاوە كە بە "تەواتور" و كۆی دەنگ شایەتییان لەسەر داوە، هەروەك لە ڕێی هەواڵی "ئەهلی كەشف"یشەوە چەسپاوە كە دڵنیایییەكی بێ گومان بە مرۆڤ دەبەخشێت.

**لە مانەوە بە پوختی دەگەینە ئەوەی كە:**

بەختەوەریی دنیا - وەك هی قیامەت - لەوەدایە كە ببین بە سەربازێكی دڵسۆز و لێبڕاو لە پەرستشی خوای گەورەدا.

كەواتە، پێویستە هەردەم بڵێین:

"الحمد لله على الطاعة والتوفيق" و، شوكرانەی خوای گەورە بكەین لەسەر ئەوەی كە كردووینی بە موسڵمان.

# وتەی چوارەم

بسم الله الرحمن الرحيم

**(الصَّلاةُ عمادُ الدِّين)**

ئەگـەر دەتـەوێت ڕادەی بـەها و گرنگیـی نوێـژت بـۆ دەربکـەوێت و، بزانیـت چ دەستکەوتێکی گەورەیە و، چۆن مرۆڤ ئەم دەستکەوتەی بە ئاسانی دەستگیر دەبێت..

هـەروەها ئەگـەر دەتـەوێ گێلـی و تێنەگەیشتنی ئـەو کەسـەت بۆ دەربکـەوێت کـە ئـەم پەرستشە ئەنجام نادات و، بزانیت چەندە مرۆڤێکی زەرەرمەندە..

بەڵێ، ئەگەر حەز دەکەیت ئەمانە بزانیت و بە ئەندازەی (دوو کەرەت دوو دەکاتە چوار) لێی دڵنیا ببیت، ئەوا سەرنج لەم چیرۆکە کورتە بدە و لـێی ورد بەرەوە:

جارێکیـان فەرمانڕەوایـەکی گـەورە دوو خزمـەتگوزاری خـۆی بـۆ باخچەیـەکی تایبـەتیی جوان و دڵڕفێن نارد کە دوو مانگ ڕێ دوور بوو، یەکی بیست و چوار لیرەی زێڕیشی دانـێ تاکو پێی بگەنە مەزراکە و لەوێ نیشتەجێ بن و، پێی وتن:

(بلیت و پێداویستییەکانی گەشتەکەتان و پێویستییەکانی ناومـاڵ و نیشـتەجێ بوونتـان، بـەم پارەیـە بکـڕن.. دوای ڕۆژە ڕێیـەکیش دەگەنـە ئیسـتگایەك کـە هـەموو هۆکارەکـانی گواستنەوەی تێدایـە لـە ئۆتۆمبێـل و، فڕۆکـە و، شـەمەندەفەر و، پاپۆڕ.. نرخـی سـواربوونی هەرکام لەمانەش لەوی تر جیایە و بە پێی سەرمایەی ئەو کەسەیە کە سواری دەبێت).

ئـەوانیش دوای وەرگرتنـی ئـەم دەرس و ئامۆژگاریيانـە، کەوتنـەڕێ. یـەکێکیان لەبـەر ئەوەی مرۆڤێکی بەختەوەر و شادمان و ژیر بوو، بەشێکی پارەکەی بە جۆرێك فەرمانڕەوا پێی ڕازی بێت، خستەکار و کەسابەتەوە تا گەیشتە ئیستگاکە و، سـوود و قـازانجێکی زۆری لـێ دەست کەوت بە چەشنێك کە سەرمایەکەی یەك بۆ هەزار زیادی کرد.

بەڵام ئەوی تریان لەبەر ئەوەی هەرزە و بەدبەخت بوو، تا گەیشتە هەمان جێ، بیست و سێ لیرەی بە قومار و هەڵەخەرجی بە زایە دا و تەنها یەکێکی پێ مایەوە!

لەبەر ئەوە، هاورێکەی پێی وت:

کاکی خۆم! ئەم لیرەیەی ئێستا پێت ماوە بلیتی سەفەری پێ بکڕە و بە خۆڕایی لە دەستی مەدە، بۆ ئەوەی لەم ڕێگا دوور و درێژەدا بە برسێتی و ئاوارەیی نەمێنیتەوە. فەرمانڕەوای گەورەشمان تابلێی لێبوردە و جوانمەردە، بەڵکو لە کەموکووڕییەکانت خۆش ببێت و تۆش سواری فڕۆکە بکات و پێکەوە لە ماوەی ڕۆژێکدا بگەینە نیشتەجێی خۆمان. خۆ ئەگەر بە گوێیشم نەکەیت، ئەوا ناچار دەبیت کە بە پێ بکەویتە ڕێ و بە دوو مانگی ڕەبەق و بە برسێتی و نامۆیی و تەنیایی ئنجا بیبڕیت و بگەیتە جێ.

جا ئەگەر ئەم هاورێیە سەرپێچیی نواند و، بەو تاکە لیرەیەی پێی ماوە بلیتەکەی نەکڕی - کە وەك کلیلی دەرگای گەنجینەیەك وایە - بەڵکو لە پێناوی حەز و چێژێکی سەرپێیی‌دا بەکاری هێنا، ئایا تەمبەڵترین مرۆڤیش تێناگات کە ئەو کەسە چەندە بەدبەخت و زەرەرمەند و گێژ و گەلحۆیە؟

* * *

ئەی ئەو کەسەی کە نوێژ ناکات!

هەروەها ئەی نەفسی خۆیشم کە حەزت لە نوێژ نی‌یە و پێت ناخۆشە!

مەبەست لەو فەرمانڕەوایە: خوای پەروەردگار و بەدیهێنەرمانە..

دوو خزمەتگوزارەکەش: یەکێکیان ئەو کەسەیە کە ڕێی ئایینی گرتووەتە بەر و، زۆر بە پەرۆشی و تاسەوە نوێژەکانی دەکات.. مەبەست لەوی تریشیان ئەو مرۆڤە بێ ئاگایانەیە کە وازیان لە نوێژ کردن هێناوە..

بیست و چوار لیرەکەش، بریتی‌یە لەو بیست و چوار سەعاتەی شەو و ڕۆژ کە تەمەنی مرۆڤیان لێ پێکدێت..

باخچە تایبەتی و جوانەکەش بریتی‌یە لە بەهەشتی بەرین..

مەبەست لە ئیستگاکەش گۆڕی مرۆڤە، کە لێیەوە دەڕوات بۆ جیهانێکی تر..

گەشت و سەفەرەکەش، ئەو گەشتەیە کە مرۆڤ لە سەرەتای لەدایکبوونیەوە دەستی پێ دەکات و بە دەرگای گۆڕدا تێدەپەڕێت تا دەگاتە ئەودنیای هەمیشەیی و ئنجا لەوێ کۆتایی بە گەشتەکەی دەهێنێت.

ئەوانەش بەم ڕێگایەدا گوزەر دەکەن بەش بەشن، هەر بەشەی بەپێی پایەی کردەوەکانی خۆی پلەی بۆ دانراوە؛ هەندێك لەو خواپەرستانە وەك هەورە بروسکە ماوەی هەزار ساڵ بە یەك ڕۆژ دەبڕن و، هەندێکی تریان - وەك خەیاڵ - لە یەك ڕۆژدا ماوەی پەنجا هەزار ساڵ دەبڕن، وەك قورئانی پیرۆز لە دوو ئایەتدا پەنجەی بۆ ئەم ڕاستی‌یە ڕاکێشاوە[1]..

مەبەست لەو بلیتەش (نوێژ)ە..

لە ڕاستی‌دا تەنها یەك سەعات لەو بیست و چوار سەعاتە سەروزیادە بۆ نوێژ و دەستنوێژی ماوەی ئەو شەو و ڕۆژە.

ئایا ئەو کەسەی کە بیست و سێ سەعاتی شەو و ڕۆژ بۆ ئەم دنیا زۆر کورت و کەمخایەنە سەرف دەکات و تاقە سەعاتێکیشی بۆ ژیانی نەبڕاوەی هەمیشەیی تەرخان ناکات، چەندە ستەم لە خۆی و کارێکی دوور لە ژیری دەکات؟!

بەڵێ، ئەگەر خەرجکردنی نیوەی سامان لە قومارێکی وەك "یانسیب"دا، کە هەزار کەس بەشداریی تێدا دەکەن، بەلای هەندێکەوە بە کارێکی ژیرانە بژمێررێ، کە ڕێژە و گریمانی بردنەوەشی یەك لە هەزارە، ئەی ئەو کەسەی کە یەك لە بیست و چواری سامانی خۆی لە قازانجێکی گومان لێ نەکراودا و لە دەستکەوتنی گەنجینەیەکی هەمیشەیی‌دا بەشدار ناکات - کە ڕێژەی قازانجی لە سەدا نەوەدونۆیە - کارەکەی پێچەوانەی ژیری و دژی دانایی نی‌یە؟ ئایا هەر کەسێك خۆی بە ژیر و تێگەیشتوو بزانێت لەمە تێناگات؟!

لە هەمان کاتیشدا نوێژ کردن، خۆی لە خۆی‌دا، حەسانەوەیەکی تابلێی گەورە بە "گیان" و "دڵ" و "ژیری"ی مرۆڤ دەبەخشێت، جگە لەوەش کارێکی قورس و مایەی بێزاریش نی‌یە بۆ "جەستە"ی مرۆڤ. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، ئەو کەسەی نوێژەکانی بەجێ دەهێنێت، بەهۆی نیازی پاك و خاوێنەوە، هەموو کار و کۆششێکی حەلاڵی تری بۆ دەبێت بە پەرستش و، بە عیبادەت بۆی دەنووسرێت.

بەم چەشنە، مرۆڤی نوێژکەر دەتوانێت هەموو سەرمایەی تەمەنی بەرەو ئاخیرەت بەرێ بکات و، بە تەمەنە کورت و فانی‌یەکەی دنیای، تەمەنێکی هەمیشەیی لە دواڕۆژدا بەدەست بهێنێت.

---

(١) لەوانەیە نووسەر ئامازە بۆ ئەم دوو ئایەتە بکات: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ﴾(الحج:٤٧)، ﴿تَعْرُجُ الملائكة والروح إِلَيْهِ في يوم كان مقداره خمسين ألف سنة﴾(المعارج:٤). (وەرگێڕ)

# وتەی پێنجەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إِنَّ اللهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ﴾ (النحل: ١٢٨)

ئەگەر دەتەوێ بزانیت کە "بەجێهێنانی نوێژ" و "خۆپاراستن لە گوناهە گەورەکان" فەرمانبەرێتیی ڕاستەقینەی ئادەمیزادن و، ئاکامێکی گونجاون لەگەڵ فیترەت و سروشتی مرۆڤدا.. ئەوا سەیری ئەم چیرۆکە بکە و گوێی لێ ڕابگرە:

لە جەنگی گەورەی جیهانی(سەفەربەرلك)دا دوو سەرباز پێکەوە لە تیپێکدا بوون. یەکێکیان: کارگوزار و مەشق پێ کراو بوو، ئەرك و فەرمانی خۆیشی تا بڵێیت بەدڵ بوو.. ئەوی تریشیان: هیچ نەزان و تەمبەڵ و، سك و نەفس پەروەر بوو.

یەکەمیان، کە ئەرکی خۆی بە ڕێکوپێکی ڕادەپەڕاند، هەمیشە بایەخی بە مەشق کردن و داخوازییەکانی جیهاد دەدا و، هەرگیز بیری لە پێداویستییەکانی خواردن و خواردنەوە نەدەکردەوە، چونکە دڵنیا بوو لەوەی کە: بەخێوکردن و تیماری کردنی لە کاتی نەخۆشیدا و دابین کردنی کەرەسە و ئامێر و پێداویستییەکانی، تەنانەت پاروو کردنیش بە دەمیەوە لە کاتی پێویستدا، ئەمانە هەموویان کار و ئەرکی سەرشانی دەوڵەتن. بەڵام ئەرکی سەرشانی ئەم تەنها مەشق کردن و جیهادە. خۆ ئەمەش ڕێ لەوە ناگرێت کە هەندێ جار و لە کاتی پێویستدا ئامادە کردنی خواردن و هەندێ کاروباری وەك شۆردنی قاپ و کەوچکەکانی خواردن بخاتە ئەستۆی خۆیەوە.

جا ئەگەر پرسیار لەم سەربازە بکرایە و پێی بوترایە:

ئایا تۆ خەریکی چییت و بە چ کارێکەوە سەرقاڵیت؟

لە وەڵامدا دەیوت:

(من هەندێ لە داواکاری و ئەرکەکانی دەوڵەتم بە ڕەزامەندیی خۆم گرتووەتە ئەستۆ، بێ ئەوەی لە بەرامبەری ئەم کارەمەوە چاوەڕوانیی هیچ پاداشتێك بکەم).

هەرگیز نەیدەوت: بۆ دابین کردنی ژیان و خەرجیی خۆم تێدەکۆشم..

بەڵام گەر هەمان پرسیار ئاراستەی ئەو نەزانە سلك پەروەرە بکرایە، کە گوێی بە جەنگ و مەشق و فێربوون نەدەدا، لە وەڵامدا دەیوت:

(ئەوە ئەرکی دەوڵەتە و هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نییە).

بەم چەشنە، هەردەم لە هەوڵی خواردن و خەرجیدا بوو، دەچوو تیپەکەی خۆی بەجێ دەهێشت و لە ناو بازارەکاندا سەرگەرمی مامەڵە و کڕین و فرۆشتن دەبوو.

ڕۆژێکیان هاوڕێ بەگوڕ و مەشق پێ کراوەکەی پێی وت:

(برادەر! ئەو ئەرك و فەرمانبەرییە سەرەکییەی کە تۆی لێرەدا بۆ هێنراویت تەنها جیهاد و مەشق کردنە. بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی تریشت، پشت بەو پادشایە ببەستە کە تۆ لە سوپاکەیدایت، دڵنیابە کە نایەڵێت بە برسێتی بمێنیتەوە. چونکە بەخێو کردنی تۆ و ئامادە کردنی پێداویستییەکانت ئەرك و فەرمانبەریی ئەوە. پاشان بیشزانە کە تۆ تاقە کەسێکی تەنها و هەژاریت و لە هەموو جێگایەکدا خۆت پێ بەخێو ناکرێت. ئەوەش لە یادی خۆت مەبەرەوە کە ئێستا ئێمە لە جیهاد و جەنگێکی جیهانیی گەورەدا دەژیین، ئەگەر لەسەر یاخی بوون بەردەوام بیت، ئەوا زۆر نزیکە پادشا لە تۆڵەی ئەم یاخی بوونەتدا سزایەکی سەخت و گەورەت بدات لەو سزایانەی کە بەسەر ئەوکەسانەدا دەدرێت لە کاتی تێکهەڵڕژان و هێرشی جەنگدا هەڵدێن و ڕادەکەن!

کەواتە ئێمە لە بەردەم دوو ئەرك و فەرمانبەریدایین:

یەکێکیان: فەرمانبەریێتیی پادشا خۆیەتی، کە بەخێو کردنی ئێمەیە. هەرچەندەش هەندێ جار لەو ئەرکەی خۆیدا بێ بەرامبەر دەمانخاتەکار.

ئەوی تریان: فەرمانبەریێتیی تایبەتیی خۆمانە کە ئێمەی بۆ تەرخان کراوین، ئەویش جەنگ و مەشق کردنە. خۆ بێ گومان پادشا لەمەشدا یارمەتیمان دەدات و ئاسانکاریی پێویستمان پێشکەش دەکات).

* * *

براکەم! بێ گومان تێ گەیشتیت لەوەی کە ئەگەر هات و ئەم یەکەیان گوێی بۆ ئەو هاوڕێ دڵسۆز و موجاهیدەی خۆی ڕانەگرێت، چ زیانێك ڕووی تێ دەکات و خۆی دەخاتە چ مەترسییەکەوە.

ئێستاش ئەی نەفسی تەمبەڵم!

بزانە کە: مەبەست لە گۆڕەپانی جەنگ لەم چیرۆکەدا: ئەم ژیانە شلۆق و شڵەژاوەی دنیایە..

ئەو تیپە سەربازییانەش: نەوە و وەچەکانی مرۆڤایەتین لە دێر زەمانەوە هەتا ئێستا..

مەبەست لەو تیپە ناوبراوەیش: کۆمەڵگای موسڵمانی نوێی ئێستامانە..

ئەو دوو سەربازەش لەو تیپەدا، یەکەمیان: مرۆڤی دڵ وریا و ئاگادارە کە درێغی لە بەجێهێنانی فەرزەکانی ناکات و لە گوناهە گەورەکان دوورە پەرێزە و هەردەم لە تەقوا و خواپەرستیدایە و خەریکی موجاهەدەی نەفس و شەیتانە، تاکو خۆی لە تاوان و گوناهباری بپارێزێت. ئەوی تریشیان: مرۆڤی زەرەرمەندی فاسقە کە وازی لە بەجێهێنانی فەرزەکان هێناوە و کەوتووەتە داوی ئەو خەتابارییەی کە لە ڕێی پەیدا کردنی ڕۆزیدا دێتە ڕێی و، بە هەڵپەوە لە خەمی ژیان و گوزەراندایە و، ئەم هەوڵە بێ وچانەشی بۆ دنیا گەیاندوویەتە ئەوەی کە تەنانەت ڕۆزیدەری ڕاستەقینەش تۆمەتبار بکات!

مەبەست لەو مەشق و داخوازییانەش: داخوازییەکانی خواوەندە کە لە پێش هەموویانەوە نوێژ و پەرستشە..

ئەو جەنگەش بریتییە لە: ئەرکی جیهاد لە دژی نەفس و شەیتان و ئارەزووبازی و گوناهـ و ڕەوشتە نزمەکان و شەیتانەکانی "جیننی" و "ئینس" بۆ دەرباز کردنی "دڵ" و "گیان"ی مرۆڤ لە فەوتان و لەناوچوونی هەمیشەیی..

ئەو دوو فەرمانبەرییەش، یەکەمیان بریتییە لە: گوزەران و بەرێخستنی ئەم ژیانەی دنیا کە خوا بەخشیویەتی بە مرۆڤ، دووهەمیشیان بریتییە لە: پەرستش و نزا و پاڕانەوە لە دەرگانەی بەخشندەی ژیاندا و دڵارامی و پشت بەستن بەو خواوەندە.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە ژیانی بەخشیوە و، کردوویەتی بە سنعەتێکی سەمەدانیی ئەوتۆ کە بە درەخشانترین موعجیزەی خۆی بنیاتی ناوە و ڕازاندوویەتەوە، هەر ئەو خواوەندە بەخشندەیە خۆیشی درێژە بە ڕۆزی دان و پەروەردە کردن و ژیانیش دەدات.

خۆ ئەگەر بەڵگەیشت لەسەر ئەم ڕاستییە دەوێت، ئەوا سەرنج بدە، دەبینیت کە:

لاوازترین و گێلترین زیندەوەر (وەك ماسی و کرمی میوەکان) باشترین ڕۆزییان پێ دەدرێت و، لاوازترین و بچووکترین بەدیهاتوویش (وەك بێچووەکان و ساوایان) پاکترین و پوختەترین ڕۆزییان پێ دەبەخشرێت!

بەڵێ، بۆ ئەوەی باشتر بۆت ڕوون ببێتەوە کە پەیدا کردنی ڕۆزیی "حەڵاڵ" پشت بە هێز و دەستەڵات نابەستێت، بەڵکو - بە پێچەوانەوە - لاوازی و بێ دەستەڵاتی دەبن بەهۆکاری دەستکەوتنی ڕۆزی، ئەوا تەنها بەراورد کردنێك لە نێوان: "ماسییە دەبەنگەکان" و "ڕێوی".. هەروەها لە نێوان "بێچووە بێ هێزەکان" و "جانەوەرە دڕندەکان".. هەروەها "درەختە ڕاوەستاوەکان" و "ئاژەڵە بە هەڵپە و تەماعەکان"دا، سەروزیادە بۆ ئەوەی ئەم ڕاستییەت بە تەواوی بۆ ڕوون بکاتەوە!

کەواتە ئەو کەسەی لە پێناوی ژیان و گوزەراندا نوێژ و پەرستشەکانی پشتگوێ دەخات، وەك ئەو سەربازە وایە کە مەشق و سەنگەری جیهاد بەجێ دەهێڵێت و دەکەوێتە سوالکردن لە بازارەکاندا.

بەڵام ئەو کەسەی کە دوای بەجێهێنانی نوێژ و پەرستشەکانی، کاروبارەکانی تری دەپەڕێنێت و لە گەنجینەی میهرەبانیی خواوەندی ڕۆزیدەردا بە شوێن ڕۆزیی خۆیدا دەگەڕێت، تاکو نەبێت بە بار بەسەر کەسی ترەوە و دەست لە هیچ کەسێك پان نەکاتەوە.. ئەم کارەی ئەو، لە ڕاستیدا کارێکی گەلێ جوامێرانەیە، تەنانەت ئەم چەشنە کردارە بە جۆرێك لە جۆرەکانی "پەرستش" بۆ خاوەنەکەی دەژمێررێت و پاداشتی بۆ دەنووسرێت.

سەرەڕای ئەمەش، سروشتی مرۆڤ و ئامێرە مەعنەوییەکانی، بە ئاشکرا دەری دەخەن کە مرۆڤ تەنها بۆ "خواپەرستی" خوڵقێنراوە و بەس، چونکە ئەو کردار و توانستەی کە لە مرۆڤدایە و بتوانێت بۆ ژیانی دنیای تەرخان بکات، ناگاتە ئەندازەی ئەو کردار و توانستەی کە لە بچووکترین و بێ دەستەڵاترین باڵندەی وەك چۆلەکەدا دەبینرێت کە زۆر زیاتر و باشتر لە مرۆڤ لەزەت لە ژیان دەبات. بەڵام سەبارەت بە ژیانی مەعنەویی دوارۆژەوە و ئەو شتانەی کە خوا پێی بەخشیوە، وەك: زانست و، هەژاری لە بەردەم دەستەڵاتی خوای گەورەدا و، نزا و پاڕانەوە و، پەرستش.. مرۆڤ - لەمانەدا - پادشا و سەرکردەی هەموو زیندەوەرانە!

کەواتە تۆش ئەی دەروونەکەم!

ئەگەر ئاواتی هەرە گەورەت ژیانی دنیا بێت و هەموو کردار و کۆششێکت بۆ ژیانی ئەم دنیایە تەرخان کردبێت، ئەوا گومان لەوەدا نییە کە لە حوکمی لاوازترین و بچووکترین چۆلەکەدا دەبیت.

بەڵام گەر ئاواتی هەرە گەورەت ژیانی ئەودنیا بێت و، ژیانی ئەم دنیاشت کردبێت بە کێڵگە و مەزرایەك بۆ ئەو کردەوە باشانەی کە لە پاشەڕۆژدا بەروبووم دەبەخشن، ئەوا هەر لەم دنیایەدا دەبیت بە سەرکردەیەکی گەورەی گشت گیانەوەران و بەندەیەکی نازداری خوای گەورە و میوانێکی ئازیزی پەروەردگار لەم میوانخانەیەی دنیادا.

بەم چەشنە دەرکەوت کە: تەنها دوو ڕێگات لە بەردەمدایە، هەرکامیانت دەوێت دەتوانیت هەڵی بژێریت.

بەڵام لە پێشدا داوای ڕێنمایی و سەرکەوتن و یاریدەدان تەنها لە خوای بەخشندەی میهرەبان بکە!

# وتەی شەشەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾ (التوبة:١١١)

ئەگەر دەتەویێت بزانیت کە فرۆشتنی نەفس و سامان بە خوای گەورە و بوون بە بەندە و سەربازی پەروەردگار چەندە بازرگانی‌یەکی بەپیت و قازانج بەخشە و چەندە پلەوپایەیەکی بەرز و بڵندە، ئەوا گوێ بۆ ئەم چیرۆکە ڕابگرە:

پادشایەك دوو کێڵگەی گەورەی بە دوو کەس لە دانیشتووانی وڵاتەکەی خۆی بە ئەمانەت سپارد. هەموو شتێکیش لەم دوو کێڵگەیەدا هەبوو، لەکارگە و ئامێر و چەك و ئاژەڵ و گەلێ شتی تر. لەو کاتەشدا جەنگێکی گەورە و گەرم لە ئارادا بوو کە هەموو شتێکی وێران دەکرد و لە ناوی دەبردن و، تێکدان و ون کردن و وێرانی و گۆڕانکاریی بەسەر هەموو شتێکدا دەهێنا. لەبەر ئەمە و لەم کاتەدا، پادشاکە - بە سۆز و میهرەبانی و بەزەیی خۆی - یەکێکی لە پیاوە نزیك و باوەڕ پێکراوەکانی خۆی هاوڕێ لەگەڵ ئەم فەرمانە پڕ لە سۆز و بەزەیی‌یەدا بۆ لای ئەم دوو کەسە نارد:

◆ (ئەم ئەمانەتەم پێ بفرۆشنەوە کە لای ئێوە دامناوە، تاکو بیپارێزم بۆ خۆتان و لەم کاتە ناهەموارەدا لە دەستتان دەرنەچێت و بێهوودە نەڕوات. هەر کە جەنگیش تەواو بوو، دەتاندەمەوە..

◆ وەك ئەوەی ئەمانەتەکە موڵکی خۆتان بێت، نرخێکی باشتان لە بەرامبەرەوە بۆ دادەنێم و پاداشتێکی چاکتان دەدەمەوە..

◆ سەرجەمی ئەو ئامێر و مەکینانەی کە لاتان دامناون، لە کارگەکانمدا و بە ناوی خۆمەوە دەیانخەمە کار. بەمەش نرخیان یەك بۆ هەزار بەرز دەبێتەوە. سەرەڕای ئەمە، هەموو قازانجێکیشی هەر بۆ خۆتانە..

◆ خۆم بەرپرسی گشت پێویستی و خەرجی‌یەکی ئەو ئامێرانە دەبم، چونکە ئێوە لەبەر "هەژاری" و "بێ دەستەڵاتی" توانای ئەو خەرجی‌یانەتان نی‌یە..

◆ هەموو بەرهەم و دەستکەوتێکی کارگەکەش بۆ خۆتـان دەگێڕمەوە. ئەوەش بزانن کە جاریّ لای خۆتـان دەیهێڵمـەوە هـەتا کـاتی وەرگرتنـەوەی دێـت. بۆ ئـەوەی سـوودی لـێ وەربگرن.

ئەمە پێنج دەستکەوت لە تەنها یەك مامەڵەدا.

بەڵام ئەگەر بە منی نەفرۆشنەوە، ئەوا:

● گومان لەوەدا نی‌یە کە هەرچیتان لایە دەفەوتێت و لە دەستتان دەچێت! چونکە وەك لە بەرچاوتاندایە هیچ کەسێك ناتوانێت شتی خۆی بپارێزێت..

● لەو نرخ و پاداشتە بەرزانە بێ بەش دەبن..

● ئەو مەکینـە و ئـامێر و کـانزا و تـەرازووە بەنرخانـەش، لــە ئـەنجامی کـار پێ‌نـەکردن و فەرامۆش کردنیان، نرخیان نامێنێت و بێ کەڵك دەمێننەوە..

● هەر تەنها خۆتان بەرپرسی بەڕێوەبردن و پاراستنیان دەبن.

● سەرەنجامیش سزای دەست پیسیتان لەم ئەمانەتە دەچێژن!

ئەمەش پێنج زیان لە تەنیا یەك مامەڵەدا.

سەرەڕای ئەمانەش، ئەو کەسەی بە منی بفرۆشێتەوە دەبێـت بـە سـەربازێکی سەربەسـت و نەبەرد و تایبەتیی خۆم و، بە ناوی منەوە ڕەفتار و هەڵسوکەوت دەکـات، نـەك وەکـو دیلێکـی دەست بەسەر و ئاسایی و بێ خاوەن)!

* * *

لێرەدا دوو پیاوەکە بە وردی گوێیان لەم وتە شیرین و فەرمانە پادشایی‌یە ڕاگرت.

زیرەك و هۆشمەندەکەیان وتی:

بەسەر چاو! بە خۆشحاڵی و شانازی و سوپاسیشەوە بەم فرۆشتنە ڕازیم.

بەڵام ئەوی تریان، کە خۆپەرست و لەخۆبایی و بە فیز و دەمار بوو، وا گومانی دەبـرد کـە ئـەو کێڵگەیـە هـەرگیز نافەوتێت و، لـە ئاڵوگۆڕی زەمانـە و تـەپاوتلی ڕۆژگــار و شــڵەژانی ڕووداوەکانی دنیا بێ ئاگا بوو، ئەم یەکەیان وتی:

نەخێر.. پادشا کێیـە؟ مـن موڵکـی خـۆم نافرۆشـم و، ژیـان و ڕابواردنیـش لـە خـۆم تێـك نادەم!

بـەڵێ، چـەرخی گـەردوون هەڵسووڕا و ڕۆژگـاریش گۆڕانـی بەســەردا هــات، تــا ئــەو ڕادەیەی کـە یەکـەمیان گەیشـتە پلـە و پایەیـەك خـەڵکی خۆزگــەیان پــێ دەخواسـت و، لــە ئاوەندی ناز و نیعمەت و چاکەکاری و کۆشکی پادشادا بە کامەرانی و بەختـەوەری دەژیـا و

گوزه‌رانی به‌سه‌ر ده‌برد. كه‌چی ئه‌وی تریان دووچاری بارێكی هێنده دژوار و گرفتاری حاڵێكی ئه‌وه‌نده ناهه‌موار بوو كه‌ هه‌موو كه‌سێك به‌زه‌یی پێدا ده‌هاته‌وه‌، هه‌رچه‌نده‌ش شایانی ئه‌و ئاكامه‌ بوو، چونكه‌ ئه‌نجامی هه‌ڵه‌ و تاوانی خۆی بوو هاتبووه‌ ڕێی. ئیتر نه‌ شادمانیی بۆ مایه‌وه‌ و نه‌ موڵك. سه‌رباری هه‌موو ئه‌مانه‌، سزای خۆیشی وه‌رگرت!

ئه‌ی ده‌روونی له‌خۆباییم!

له‌ دووربینی ئه‌م چیرۆكه‌وه‌ سه‌یری ڕووی خاوێن و دره‌خشانی "ڕاستی" بكه‌:

مه‌به‌ست له‌ پادشا: پادشای ئه‌زه‌ل و ئه‌به‌ده‌، كه‌ په‌روه‌ردگار و به‌دیهێنه‌ری خۆته‌..

كێڵگه‌ و ئامێره‌كانیش: ئه‌و شتانه‌ن كه‌ له‌ ژیانی دنیادا هه‌ن، وه‌ك: له‌ش و، گیان و، دڵ و پێكهێنه‌ره‌كانیان له‌: چاو و، گوێ و، مێشك و، ئه‌ندێشه‌. واته‌ هه‌موو هه‌سته‌ دیار و نادیاره‌كان..

نێرراوه‌ به‌رێزه‌كه‌ش: پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستمان حه‌زره‌تی محه‌ممه‌ده‌ ﷺ..

فه‌رمانه‌ پادشاییه‌ پیرۆزه‌كه‌ش: قورئانی پیرۆزه‌، كه‌ ئه‌و بازرگانییه‌ گه‌وره‌یه‌ی باسمان كرد، له‌م ئایه‌ته‌دا ڕاده‌گه‌یه‌نێت:

﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾..

ئه‌و مه‌یدانه‌ پڕ له‌ شڵه‌ژان و جه‌نگه‌ ڕووخێنه‌ره‌ش: بارودۆخی دنیایه‌ كه‌ سه‌قامگیر بوونی نییه‌ و هه‌رده‌م له‌ ئاڵوگۆڕ و ته‌پاوتلدایه‌ و، هه‌ر ئه‌مه‌شه‌ كه‌ به‌ جه‌خت كردنه‌وه‌ ئه‌م پرسیاره‌ ئاراسته‌ی بیری مرۆڤ ده‌كات و هانی ده‌دات كه‌ بڵێت:

(ئێمه‌ی ئاده‌میزاد هه‌رچییه‌كمان هه‌یه‌ وه‌ك خۆی نامێنێت و له‌سه‌ر یه‌ك بار جێگیر نابێت و له‌ ئه‌نجامیشدا له‌ ده‌ستمان ده‌رده‌چێت. ئایا ده‌بێ هیچ چاره‌سه‌رییه‌ك نه‌بێت بۆ ئه‌م باره‌ په‌رێشانه‌؟ ئایا ناگونجێت ئه‌م له‌ناوچوون و فه‌نایه‌ بكرێت به‌ مانه‌وه‌ و نه‌مری)؟

له‌م كاته‌دا كه‌ مرۆڤ نوقمی ئه‌م جۆره‌ بیر و ئه‌ندێشانه‌یه‌، گوێی له‌ زایه‌ڵه‌ی ده‌نگی ئه‌م ئایه‌ته‌ی قورئانی پیرۆز ده‌بێت كه‌ له‌ هه‌موو سووچ و ئاسۆیه‌كدا ده‌نگ ده‌داته‌وه‌!

كه‌واته‌ چاره‌ و قازانج و ده‌ستكه‌وتی گه‌وره‌ و ڕاسته‌قینه‌ لێره‌دایه‌.. چاره‌ ته‌نها فرۆشتنی ئه‌م ئه‌مانه‌ته‌یه‌ به‌ خاوه‌نی ڕاسته‌قینه‌ی خۆی. ئه‌و كه‌سه‌ی پێی بفرۆشێت پێنج ده‌ستكه‌وتی گه‌وره‌ی ده‌ستگیر ده‌بێت:

**قازانجی یه‌كه‌م:** ئه‌و سامانه‌ فانییه‌ی كه‌ له‌ناوده‌چێت، بۆی ده‌مێنێته‌وه‌ و ده‌بێت به‌ سامانێكی هه‌میشه‌یی. چونكه‌ ئه‌و ته‌مه‌نه‌ فانییه‌ی كه‌ پێشكه‌ش به‌ خوای گه‌وره‌ و زیندووی ڕاگیركه‌ری گه‌ردوون ده‌كرێت و ته‌نها له‌ ڕێی ئه‌ودا به‌كار ده‌هێنرێت، ده‌بێت به‌ ته‌مه‌نێكی

هەمیشەیی. تەنانەت خولەك و سەعاتە فانییەكانی تەمەن، كە بە وێنەی تۆوی چێنراو بە ڕ ـەت نامێنن و لەناو دەچن، كەچی بەو نەمان و لەناوچوونە گوڵ و گوڵزار بەرهەم دەهێنن، بە هەمان جۆر خولەكەكانی ئەو تەمەنەش كە لە پێناوی خوادا بەكارهێنراوە و بەسەر بردوە، لەودنیای جیهانی نەمریدا دەمیان بە گوڵزاری كامەرانی دەپشكوێت و، بەروبوومی پێگەیشتوو پێشكەش دەكەن.

**قازانجی دووهەم:** پاداشتەكەیەتی كە بەهەشتە.

**قازانجی سێهەم:** هەر ئەندام و هەستێك نرخی یەك بۆ هەزار بەرز دەبێتەوە.

بۆ نموونە: "ژیری" كە ئەندام و ئامرازێكی مرۆڤە، ئەگەر نەیفرۆشیت بە خوای گەورە و، بۆ نەفس و ئارەزووەكانی بەكاری بهێنیت، ئەوا دەبێت بە ئەندامێكی نەگبەت و بێ توانا و مایەی بێزاری! چونكە هەموو ئازارە خەمناكەكانی ڕابوردوو هاودەم لەگەڵ بەلاّ و گێرو گرفتە ترسناكەكانی داهاتوودا دەخاتە ئەستۆی مرۆڤەوە. ئەو كاتەش پلەی "ژیری" نزم دەبێتەوە و دەبێت بە ئەندامێكی زیانبەخش. هەر لەبەر ئەوەشە كە دەبینی مرۆڤی فاسق بۆ ئەوەی لە بێزارییەكانی "ژیری"ی ڕزگاری ببێت زۆربەی جار لە دەست باری سەختی ژیان هەڵدێت و پەنا دەباتە بەر مەستی و كاری بێهوودە!

بەلاّم ئەگەر "ژیری" بە خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی بفرۆشرێتەوە كە خوای گەورەیە و لە پێناوی ئەودا بەكار بهێنرێت، ئەوا دەبێت بە كلیلێك بۆ كردنەوەی خەزێنەی بێ سنووری میهرەبانیی خواوەند و گەنجینەی دانایی پەروەردگار. ئیتر بۆ هەر لایەك بڕوانێت و بە هەر چەشنێك بیر بكاتەوە، دانایی خواوەند لە هەموو شت و بوونەوەر و ڕووداوێكدا دەبینێت و، میهرەبانیی خوای گەورەی لە سەرانسەری بوونەوەردا بە درەخشانی بەرچاو دەكەوێت.

بەم پێیە "ژیری" بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە پلەی ڕابەرێكی پەروەردگاری، كە پلەیەكە خاوەنەكەی بۆ كامەرانیی هەمیشەیی ئامادە دەكات.

هەروەها بۆ نموونە: "چاو" كە یەكێكە لە هەستەكانی مرۆڤ و پەنجەرەیەكە "گیان"ی مرۆڤ لێیەوە دەڕوانێتە ئەم جیهانە، ئەگەر لە ڕێی خوادا نەخرێتە كار و پێی نەفرۆشرێت و، لە پێناوی نەفس و ئارەزووەكانیدا بەكاربهێنرێت، ئەوا بە بینینی چەند دیمەنێكی جوانی كاتی و بەسەرچوو نزم دەبێتەوە تا وەك دەلاّلێكی ئاسایی و خزمەتكارێكی لێ دێت بۆ وروژاندنی حەز و ئارەزووەكانی دەروون.

بەلاّم ئەگەر فرۆشتت بە بەدیهێنەری خۆی و لە ڕەزامەندیی ئەودا بەكارت هێنا، ئەوا هەر ئەم "چاو"ە دەبێت بە خوێنەر و سەیركەری كتێبی مەزنی گەردوون و، بینەری موعجیزاتی بەدیهاتووانی خوای گەورە لە بوونەوەردا. بەم جۆرە بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە پلە و پایەیەكی

پیرۆز و، وەك هەنگێكی لێ دێت كە لە ناو گوڵزارەكانی میهرەبانیی خواوەند لە باخچەی زەوی‌دا دەگەڕێت و، لە هەنگوینی: "پەند و، خواناسی و، خۆشەویستی"ی نووری بینینی خوا و شایەتی‌دان لەسەر بوونی، هەڵدەگلۆفێت و لە ناو "دڵ"ی مرۆڤی باوەڕداردا ڕۆی دەكات!

هەروەها ئەگەر هەستی "چەشتن"ت بە خوای دانا و بەدیهێنەر نەفرۆشیت و، هەر تەنها بۆ نەفس و گەدە بەكاری بهێنیت، ئەوا پلەی ئەو هەستە نزم دەبێتەوە تا دەبێت بە دەرگاوانی كارگە و پشتیری "گەدە"! بەڵام ئەگەر فرۆشتت بە خوای گەورەی ڕۆزیدەر و بەخشندە، ئەوا ئەم هەستە پلەی هێندە بەرز دەبێتەوە تا دەبێت بە بینەرێكی كارامەی گەنجینەكانی میهرەبانیی خواوەند و، وای لێ دێت كە بە شوێن نیعمەتەكانی خواوەندی بەتوانا و دەستەڵاتدا بگەڕێت هەتا شوكرانەبژێری‌یان پێشكەش بكات.

هەموو ئەندام و هەستەكانی تری مرۆڤ بەم چەشنەن.

جا ئەی "ژیری"! بە وردی بیر بكەرەوە.. ئایا ئەندام و ئامێری شووم و زیانبەخش لە كوێ و، كلیلی گەنجینەی بوونەوەران لە كوێ؟

ئەی "چاو"! بە جوانی بڕوانە.. دەڵاڵی پلە نزم لە كوێ و، خوێنەری كتێبخانەی خواوەند لە كوێ؟

ئەی "زمان"! بە شیرینی بچێژە.. ئایا دەرگاوانی كارگە و پشتیر لە كوێ و، بینەری گەنجینەی میهرەبانیی خواوەند لە كوێ؟

خۆ ئەگەر بەم چەشنە پێوەر و تەرازووە قیاسی هەموو ئەندام و هەستەكانی تری مرۆڤ لەسەر ئەمانە بكەیت كە باس كران، ئەوا بە ڕاستی بۆت دەردەكەوێت كە مرۆڤی باوەڕدار تایبەتكاری‌یەكی ئەوتۆ بەدەست دەهێنێت كە شیاوی بەهەشت بێت و، مرۆڤی كافریش ئەو توخمە دەگرێتە خۆی كە لەگەڵ دۆزەخدا بگونجێت.

ئەم ئەنجامەش، كە پاداشت و سزای هەردوو كیانی تێدایە، هی ئەوەیە كە مرۆڤی باوەڕدار، بەهۆی ئیمان و باوەڕەكەیەوە، ئەمانەت و ڕاسپاردەی بەدیهێنەری خۆی پاراستووە و تەنها لە نێو بازنەی ڕەزامەندی‌یەكانی ئەودا بەكاری هێناوە. بەڵام بابای كافر دەست پیسیی لەو ئەمانەتە كردووە و لە پێناوی ئارەزووەكانی و خواستەكانی دەروونی بەدخوازی‌دا بەكاری هێناوە.

**قازانجی چوارەم:** مرۆڤ تابڵێیت لاوازە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەڵا و گیروگرفتەكانی گەلێ زۆرن.. هەروەها هەژارە، بەڵام پێویستی‌یەكانی هەمیشە لە زیادبووندان..هەروەها بێ

دەستەڵاتە، کەچی ئەرکەکانی گوزەران و ژیان لەسەر شانی یەکجار قورسن و گەلێ ئەستووی دەکەن..

جا ئەگەر ئەم مرۆڤە پشت بە خوای بەدەستەڵات و خاوەن توانای ڕەها نەبەستێت و ئەرکەکانی نەداتە دەست ئەو، ئەوا ویژدانی ئازارێکی بەردەوام دەچێژێت. داخ و حەسرەت و ماندووبوونی بێ ئەنجامیشی یان ئەوەیە دەیخنکێنن و لەناوی دەبەن، یان دەیخەنە بەری مەستان و تاوانبارانەوە.

**قازانجی پێنجەم:** ئەوانەی کە لە بواری خواناسیدا پسپۆڕن و ئەهلی شهوود و کەشف و ڕە چەشتوانی ڕاستین، بە گشتی و یەکدەنگی ڕایدەگەیەنن کە ئەو پەرستش و زیکر و تەسبیحاتانەی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ بۆ ڕەزامەندیی خوا بەجێیان دەهێنن، هەموویان لە بەهەشتدا دەبن بە میوەی شیرین و بەتام و، لە کاتێکدا پێشکەشت دەکرێن کە تۆ زۆر پێویستت پێیانە.

خۆ ئەگەر پشت لەم بازرگانییە پڕ پیت و بەرەکەتە هەڵبکەیت و لە کیسی خۆتی بدەیت، ئەوا هەروەك لەم قازانج و دەستکەوتە زۆرانە بێ بەش دەبیت، پێنج دانە زیانیش دەکەیت:

**زیانی یەکەم:** هەرچی سامان و مناڵ و نەفس و ژیان و لاویت هەیە، کە حەزت لێیانە و خۆشت دەوێن، هەموویان لەناودەچن و نامێنن. بەڵام ئازار و گوناهەکانیان هەر دەمێننەوە و بەری سەرشانت قورس دەکەن.

**زیانی دووهەم:** سزای ئەوانە دەدرێیت کە دەستپیسی لە ئەمانەت دەکەن، چونکە تۆ ستەمێکی یەکجار گەورەت لە خۆت کردووە کاتێك بەنرخترینی ئەندامەکانت لە بێ نرخترین کرداردا بەکار هێناوە.

**زیانی سێهەم:** ستەم و دەستدرێژیت بۆ سەر دانایی خواوەند کردووە، بەوەی کە گشت ئەو ئەندام و کۆئەندامە جوان و بەنرخەکانی مرۆڤت گەیاندە ئاست و پایەی ئەندامەکانی ئاژەڵ، بەڵکو لە هی ئاژەڵیش نزمتر.

**زیانی چوارەم:** هەمیشە لە ناشکوری و شیوەن و خەفەتدا دەبیت لە دەست ئازارەکانی جودایی و لێکبڕان و، لەتاو ئەو ئەرکانەی ژیان کە خۆت بە دەستی خۆت باری ژیانت پێ قورس کردوون. لە کاتێکدا کە تۆ لە "هەژاری" و "بێ دەستەڵاتی"یەکی بەردەوامدا دەتلێیتەوە.

**زیانی پێنجەم:** خەڵاتە جوانەکانی خوای میهرەبان، چەشنی: (ژیری و چاو و دڵ و زمان و ئەوانی تر) بۆ ئەوە بە تۆ بەخشراون کە ئامادەت بکەن و بە وێنەی کلیلێك بۆ کردنەوەی دەرگاکانی کامەرانیی هەمیشەیی بەکاریان بهێنیت. بەڵام زیانێکی چەندە گەورەیە گەر بڕۆنە قاڵبێکی پڕ لە ئازارەوە بە جۆرێك کە دەرگاکانی دۆزەخت بۆ بخەنە سەرپشت!

ئێستاش با سەیرێکی ئەم فرۆشتن و بازرگانییە بکەین. با بزانین ئایا لە ڕاستیدا هێندە قورسی و ماندووبوونی تێدایە کە زۆر کەس لێی ڕادەکەن و نزیکی نابنەوە..

نەخێر، هیچ قورسییەکی تێدا نییە.. چونکە بازنەی "حەڵاڵ" ئەوەندە بەرین و فراوانە کە بۆ حەسانەوە و بەختەوەری و کامەرانیی مرۆڤ سەروزیادە و، هیچ پێویستییەك بۆ مرۆڤ ناهێڵێتەوە کە خۆی بخاتە ناو بازنەی "حەرام" و گوناهکارییەوە.

فەرزەکانی خوای گەورەش سووك و کەمن.. بوون بە سەرباز و بەندەی خوای گەورەش شتێکی ئەوەندە بەتام و پلە و پایەیەکی ئەوەندە بەرز و بەڕێزە کە لە باسکردن نایەت.

کەواتە پێویستە – ئەی نەفسەکەم! – تۆش ببیت بەو سەربازە و، بە ناوی خواوە دەست بە کارەکانت بکەیت و، لە پێناوی خوادا ببەخشیت و وەربگریت و، هەموو ئارامی و جموجووڵێکیشت تەنها لە بازنەی ڕەزامەندییەکانی خوای گەورەدا بێت. خۆ ئەگەر هەر کەموکوورییەکیش هەبوو ئەوا دەرگای تۆبە و داوای لێخۆشبوون هەمیشە واڵا و کراوەیە. دەسا تۆیش لێی بپاڕێرەوە و بڵێ:

دەسا خوایە گیان!

لە هەڵەکانمان خۆش بە..

لە ڕیزی بەندەکانی خۆت وەرمان بگرە..

یارمەتیمان بدە کە هەمیشە دەستپاك بین بەرامبەر بەو ئەمانەتەی پێت سپاردووین، تا ڕۆژی بەیەك گەیشتنەوە.

ئامین.

# وتەی حەوتەم

کلیلی مەتەڵی ئەم بوونەوەرانە:
(آمَنْتُ باِللهِ وباليَوْمِ الآخِر)

ئەگەر حەز دەکەیت تێبگەیت لەوەی کە (باوەڕبوون بە خوا و ڕۆژیی دوایی) هەموو مەتەڵە گرنگەکانی بوونەوەر شی دەکەنەوە و، گشت دەرگاکانی کامەرانی بۆ "گیان"ی مرۆڤ دەخەنە سەرپشت و، هەموو گیرو گرفتێکیش بەوپەڕی ئاسانی حەل دەکەن و لای دەبەن..

هەروەها ئەگەر حەز دەکەیت تێبگەیت لەوەی کە: "پشت بەستن" بە خواوەندی بەخشێنەر و پەنا بردن بۆ ئەو خواوەندە لە ڕێگای سەبر و ئارامگرتنەوە و، نزا و پاڕانەوەش لە دەرگای ڕۆزیدەردا بەهۆی شوکر و ستایشەوە، دوو چارەسەریی پڕ سوود و شیفابەخشن بۆ دەرد و زامەکانی مرۆڤ..

هەروەها ئەگەر حەز دەکەیت تێبگەیت لەوەی کە گوێ ڕاگرتن بۆ قورئانی پیرۆز و گوێڕایەڵی بۆ فەرمانەکانی و بەجێهێنانی فەرزەکان و خۆپاراستن لە گوناهی گەورە، چاکترین توێشووی ڕێی ئاخیرەت و ڕووناکیی ناو گۆڕ و ئاسانترین و بەهادارترینی بلیتی سەفەرن لە گەشتی هەتاهەتاییدا..

بەڵێ، ئەگەر حەزت لە تێگەیشتنی هەموو ئەم شتانە هەیە، ئەوا گوێ لەم کورتە چیرۆکە بگرە:

ڕۆژێکیان سەربازێك لە گۆڕەپانی جەنگێکی گەورە و جیهانیدا کەوتە ناو گیرو گرفتێکی گەورە و سەرسووڕهێنەرەوە، چونکە لە هەردوو لای ڕاست و چەپیەوە پێکرا و دوو زامی قوڵیان تێدا دروست بوو. هەر لەم کاتەشدا شێرێك لە پشتیەوە لە کەمیندا بوو؛ وەخت بوو هێرش بباتە سەری و تێکی بشکێنێت! لە پێشیشیەوە چەندین سێدارەی لە بەردەمدا بوو کە دوای ئەوەی هەموو خۆشەویستەکانی پێدا هەڵواسرابوون ئەمیش چاوەڕوانی هەمان چارەنووسی دەکرد.. سەرەڕای ئەم بارە سامناك و دڵتەزێنانەش،

گه‌شتێكی نه‌فی كردن و دوورخستنه‌وه‌ی دوور و درێژ و پڕ لـه گـیروگرفت و ده‌ردی سـه‌ریی له ڕێگادا بوو..

له‌م كاته‌دا كه ئه‌م بێچاره‌یه له بیركردنـه‌وه‌ی ئه‌ ، هـه‌موو حـه‌م و پـه‌ژاره و نائومێدی‌یانـه‌دا ده‌تلایـه‌وه. لـه ناكـاودا پیـاوێكی نوورانیـی خێره‌ومـه‌ندی وه‌ك حـه‌زره‌تی‌خدری – سـلاوی خوای لـێ بێت – له لای ڕاستی خۆیه‌وه به‌دی كرد. ئه‌م پیاوه نوورانی‌یه پێی وت:

– (دڵته‌نگ و نـائومێد مه‌به، وا مـن دوو مه‌تـه‌ڵت فێر ده‌كـه‌م، ئه‌گـه‌ر بـه باشـی بـه‌كاریان بهێنیت ئه‌وا ئه‌و شێره‌ی كه ئێستا له كه‌میندایه، بۆت ده‌بێت بـه ئه‌سپێكی ئامـاده‌كراو كـه بـۆ هـه‌ر لایـه‌ك بتـه‌وێت ده‌تبـات. ئـه‌و سێدارانه‌ش سـه‌باره‌ت بـه تـۆ ده‌بـن بـه جۆلانـه‌ی كـه‌یف و شادی. سه‌ره‌ڕای ئه‌مانه‌ش دوو ده‌رمانت ده‌ده‌مێ، كه ئه‌گه‌ر به ڕێكوپێكی به‌كاریان بهێنیت، برینه‌كانت چاك ده‌بنه‌وه و ده‌بن به دوو گوڵی دڵڕفێنـی ئـه‌وتۆ كـه خۆشـترین بۆنیـان لـێ بـڵاو ببێته‌وه. هه‌روه‌ها بلیتێكی سه‌فه‌ریشت ده‌ده‌مێ كه بتوانیت به‌هۆیه‌وه وه‌ك مـه‌ل بفڕیـت و ڕێـی ساڵێكی ڕه‌به‌قی له ماوه‌ی یه‌ك ڕۆژدا پێ ببڕیت!

خۆ ئه‌گه‌ر باوه‌ڕیشم پێ ناكه‌یت، ئه‌وا هیچ نه‌بێت جارێك وته‌كانم تاقی بكه‌ره‌وه، تاكو له ڕاستیی ئه‌م قسانه‌م دڵنیا ببیت).

به‌ڵێ، ئه‌م سـه‌ربازه هـه‌ندێ لـه‌و ئامۆژگاری‌یانـه‌ی تـاقی كـرده‌وه. هـه‌تا لـه ئـه‌نجامدا بـۆی ڕوون بووه‌وه كه وته‌كانی ئه‌م پیاوه نوورانی‌یه هێنده ڕاستن كه هیچ گومانێكیان تێدا نی‌یه.

(هه‌روه‌ها منی "سه‌عید"ی بێچاره‌ش هه‌ندێكم لـێ تاقی كردنه‌وه و هیچ گومانێكم تیایاندا نه‌ما و به ڕوونی ڕاستیی ئه‌و وتانه‌م بۆ ده‌ركه‌وت).

بـه‌ڵام لـه ناكـاودا پیـاوێكی فێڵبـازی شه‌یتانئاسا لـه لای چه‌پیـه‌وه پـه‌یدا بـوو كـه خـۆی ڕازاندبووه‌وه و چـه‌ندین هۆكـاری ڕابـواردن و كه‌ره‌سـه‌ی مه‌سـتكه‌ری له‌گـه‌ڵ خـۆیدا هه‌ڵگرتبوو. ئه‌م پیاوه به‌رامبه‌ری ڕاوه‌ستا و پێی وت:

– هاوڕێكه‌م وه‌ره بۆ لام! وه‌ره با ڕابوێرین و به خۆشی كات به‌سـه‌ر بـه‌رین.. بـا پێكـه‌وه سـه‌یری وێنـه‌ی ئـه‌و كیژۆڵـه جـوانانه بكـه‌ین و، گـوێ لـه ئـاوازی ئـه‌و گۆرانی‌یـه هه‌سـت بزوێنه‌رانه ڕابگرین و.. ئه‌م خۆراكه خۆشانه هه‌ن با له ده‌ستیان نه‌ده‌ین!

پاشان پێی وت:

– ئه‌و ورته ورته چی‌یه وا له‌به‌ر خۆته‌وه ده‌یلێیت و ده‌مت پێی ده‌جووڵێت؟

– ئه‌وه مه‌ته‌ڵه!

– وازی لـێ بهێنه.. خۆشی و زه‌وق و شادیمان به‌م چه‌شنه شتانه‌ی كه لێیان تێناگه‌ین لـێ تاڵ مه‌كه.. ئه‌ی ئه‌وه چی‌یه به ده‌سته‌وه؟

- ئەوە دەرمانە!

- فرێی دە.. هیچ ترسێکت نەبێ. ئەوەتا تەندروستیت تابڵێی باشە. ئێمە وا ئێستا لە خۆشی و گاڵتە و گەپداین، کەی کاتی ئەوانەیە؟! ئەی پێم ناڵێیت ئەو بلیتە پێنج نیشانەیی‌یە چی‌یە بە دەستتەوە؟

- ئەوە فەرمانی کارگێڕی و بلیتی سەفەرە!

- بیدڕێنە.. لەم وەرزی بەهارە جوانەدا پێویستیمان بە سەفەر نی‌یە!

بەم جۆرە، هێندەی نەمابوو ئەو فیلبازە، بە فڕوفێڵەکانی، سەربازەکە لە خشتە ببات و لە ڕێ دەری بکات، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە نزیك بوو هەندێك لە قسەکانی بسەلمێنێت..

(بەڵێ ڕاستە مرۆڤ لە خشتە دەبرێ و، من خۆیشم بەهۆی یەکێکی وەك ئەم فێڵبازەوە لە خشتە برام)!

لە ناکاودا دەنگێکی بڵندی وەك نەعرەتەی هەور لە لای ڕاستیەوە بێداری کردەوە و پێی وت:

- ئاگاداربە! نەخەڵەتێی.. بەو فێڵبازە بڵێ:

- ئەگەر دەتوانیت ئەو شێرەی پشتەوەم بۆ بکوژیت..

ئەگەر دەتوانیت ئەو سێدارانە لەسەر ڕێگام هەڵبگریت..

ئەگەر دەتوانیت هەردوو زامە قوڵەکانم چاك بکەیتەوە و سارێژیان بکەیت..

ئەگەر دەتوانیت لەم گەشتە دوور و درێژ و پڕ لە ئەشکەنجەیە ڕزگارم بکەیت..

ئەگەر ئەمانە دەتوانیت، فەرموو پیشانم بدە و چارەسەری‌یەکانت دەربخە. ئەوسا دەتوانیت داوای ئەوەم لێ بکەیت کە داواکاری‌یەکانت جێبەجێ بکەم. دەنا ئەی گەلحۆی سەر لێ شێواو! دەمت بگرە و بێ دەنگ بە، سەرقاڵم مەکە و بهێڵە گوێ لەم مرۆڤە نووورانی‌یە ڕابگرم!

* * *

ئەی نەفسەکەم!

لە ڕۆژانی "لاوی"تدا زۆر جار پێدەکەنییت، کەچی وا ئێستا لە گریاندایت بۆ ئەو ڕۆژگارانەی ڕابوردووت کە وا لە دەستت دەرچوون.. دەسا خێراکە و هەر ئێستا لەو بێ ئاگایی‌یەت بێدار ببەرەوە و، بزانە کە:

ئەو سەربازە بێچارەیە: تۆ و هەموو مرۆڤێکی ترە!

ئەو شێرەش: ئەجەل و تەواوبوونی ماوەی ژیانتە..

ئەو سێدارانەش: بریتین لەو لێکبڕان و لەناوچوون و جوداییانەی کە هەموو شتێك دەگرنەوە. ئایا نابینیت شەو و ڕۆژ خۆشەویستانمان کۆچ دەکەن و یەك لە دوای یەك بەجێمان دەهێڵن؟

ئەو دوو زامەش: یەکێکیان بێ دەسەڵاتی(العجز)ی لە سنووربەدەری مرۆڤە و، ئەوی تریشیان هەژاری(الفقر)یە بێ ئەندازە و ئازاربەخشەکەیەتی کە لە ناخیدا جێگیر بوون و ڕەگ و ریشەیان داکوتاوە..

ئەو گەشتە دوورەش، بریتییە لەم گەشتی تاقیکردنەوە دوور و درێژەی مرۆڤ کە لە جیهانی "گیان"ەوە دەست پێ دەکات و، ئنجا دەچێتە ڕەحمی دایکەوە و، پاشان بەرەو منالی دەڕوات و، لەوێوە بەرەو پیری و، ئنجا لە ژیانی دنیاوە بەرەو ئاخیرەت و، پاشان حەشر و تێپەڕبوون بەسەر پردی سیراتدا..

ئەو دوو مەتەڵەش بریتین لە ئیمان بوون بە "خوا" و "ڕۆژی دوایی". بەڵێ، هەر ئەم ئیمانەیە کە دەتوانێت مردن بکات بە ئەسپێك بەڵکو بە بوراقێکی ئەوتۆ مرۆڤ لە بەندیخانەی ئێش و ئازاری دنیا دەرباز بکات و بەرەو گوڵزارەکانی بەهەشتی بەرین و خزمەتی خواوەندی گەورە و میهرەبان و شکۆمەندی ببات. هەر لەبەر ئەمەش بووە کە مرۆڤە کامڵ و تێگەیشتووەکان مردنیان خۆش ویستووە و بە لێوی گەش و خەندانەوە پێشوازییان لێ کردووە! چونکە ڕاستی و ناوەرۆکی مردنیان زانیوە و بە چاو دیویانە، بۆیە لێی نەترساون، بەڵکو خۆشیان ویستووە و بە پەرۆشەوە چاوەڕوانییان کردووە و بێ هیچ ترس و بیمێك خۆیان هەڵداوەتە ناو باوەشیەوە.

ئنجا هاتن و ڕۆشتن و تێپەڕبوونی "کات" بەسەر هەموو شتێکدا و گرفتار بوونی ئەو شتانە بە مردن و جودایی و نەمان.. ئەم نهێنی و مەتەڵە ئیمانییە دەیانگۆڕێت بە وێنەیەکی پرشنگداری ئەوتۆ کە هانی مرۆڤ بۆ بینینی تازەیی هەموو شتێك بدات لە دەمی نوێ بوونەوەیدا، تەنانەت دەبێت بەهۆی سەرنجدانی مرۆڤ لە جۆرە جیاجیاکانی موعجیزاتی داهێنانی بەدیهێنەری شکۆمەند و ڕەنگە جیاوازەکانی کاری دەراسای توانست و درەوشانەوەی میهر و بەزەیی ئەو خواوەندە میهرەبانە. ئەمەش وەك تیشکدانەوەی حەوت ڕەنگەکانی شەبەنگی خۆر وایە لەناو ئاوێنەدا و چەشنی جم و جووڵی دیمەنی وێنە سینەماییەکان وایە کە پتر جوانی و دڵڕفێنی بە خۆر و بەو دیمەنانە دەبەخشن..

ئەو دوو چارەسەرییەش:

**یەکەمیان:** ئارامگرتن و پشت بەستنە بە توانست و دانستی خوای گەورەی بەدیهێنەر و پەروەردگارمان.

- جا ئایا وایە؟ [بە سەرسووڕمانەوە پرسیار لە خۆی دەکات].

- بەڵێ وایە.. چونکە ئەو کەسەی بەهۆی ناسنامە(هویة)ی "بێ دەستەڵاتی"یەوە پاڵی بە دەستەڵاتی ئەو خواوەندەوە داوە کە فەرمانی: ﴿كُنْ فيكون﴾ی بە دەستە، لە چی دەترسێ و بۆ لە چی دەکاتەوە؟ دیارە ئەو کەسە خۆی ڕادەگرێت و گوێ بە هیچ گیرو گرفت و کێشەیەك نادات. چونکە هەڵگری ئەو ناسنامەیە لە سامناکترین کات و لە بەردەم گەورەترین گیرو گرفتدا پشت بە پەروەردگاری میهرەبانی خۆی دەبەستێت و، بەمەش تینوێتیی دڵی خۆی دەشکێنێت و، هەر کە دەڵێت: ﴿إِنَّا لِلّٰهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ (البقــــرة:١٥٦) ئەوا بە جۆرێ ئاسوودەیی هەموو گۆشە و کەنارێکی دڵی دەگرێتەوە.

کەواتە مرۆڤی خواناس هەمیشە لەو "بێ دەستەڵاتی" و ترسانەی لە خوای خۆی، چێژ وەردەگرێت و هەست بە تام و لەزەت و خۆشی دەکات.

بەڵێ زۆر ڕاستە! مرۆڤی خواناس لە دەمی ترس و بیمدا هەست بە خۆشی و لەزەت دەکات. چونکە ئەگەر بتوانین پرسیار لە منالێکی ساوا بکەین و، وا دابنێین دەئاوزێت و تێ ئەی وەڵامدانەوەی هەیە و پێی بڵێین:

- خۆشترین و بەلەزەتترین کات لە ژیانتدا کامەیە؟

لەوانەیە لە وەڵامدا بڵێت:

- بێ گومان ئەو کاتەیە کە بە ترس و بێ دەستەڵاتی و ئومێدەوە خۆم دەهاوێمە ناو باوەشی پڕ لە سۆزی میهرەبانیی دایکمەوە و، دان بە بێ دەستەڵاتیی خۆمدا دەنێم!

ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەگەر سەرجەمی سۆز و بەزەیی و میهرەبانیی دایکان کۆ بکرێنەوە، ئەوجا بە کۆی هەموویان ورشەیەکی درەوشانەوەکانی میهرەبانیی خواوەندی پەروەردگار پێکنەهێنن!

هەر لەم ڕوانگەیەوە مرۆڤانی خاوەن ئیمانی کامڵ دەستیان لە دەستەڵات و توانای خۆیان دەشۆردووە و هەستیان بە دەستەوسانیی خۆیان کردووە و تامی ترسانیان لە خوای خۆیان چەشتووە. ئیتر هانایان بۆ بردووە و خۆیان پێ پاراستووە و، ئەم بێ دەستەڵاتی و ترسەیان کردووە بە تکاکار لە دەرگانەی سۆز و بەزەیی خواوەندی میهرەباندا.

**چارەسەریی دووهەمیشیان:** بریتییە لە نزا و پاڕانەوە و، شوکرانەبژێری و، قەناعەت و، پشت بەستن بە سۆز و میهرەبانیی ڕۆژیدەریی خاوەن بەزەیی و سۆز و میهرەبانی.

- ئایا وایە؟

- بەڵێ وایە.. چونکە مادەم مرۆڤ میوانی ئەو خوایە بێت کە گۆی زەویی بۆ کردووە بە سفرەیەکی پڕ لە نیعمەت و، بەهاریشی وەك چەپکە گوڵێکی ڕازاوە و ڕەنگین لەسەر ئەو

سفره‌یه بۆ داناوه كه به هه‌ر چوار لای‌دا گوڵپڕژێنی نیعمه‌ته‌كانی كردووه، ئه‌و كه‌سه‌ی میوانی خواوه‌ندێكی ئاوا به‌خشنده و سه‌خاوه‌تمه‌ند بێت، چۆن "هه‌ژاری" و "بێ ده‌سته‌ڵاتی"ی به‌لاوه گران و ئازار به‌خش ده‌بێت؟ به‌ڵكو ده‌زانێت كه ئه‌م دووانه – هه‌ژاری و بێ ده‌سته‌ڵاتی – وه‌ك ئیشتیهای خواردن وان كه زیاتر هه‌ستی مرۆڤ ده‌بزوێنن تاكو چاوه‌ڕوانی نیعمه‌تی زیاتر بكات! به ڕاده‌یه‌كی ئه‌وتۆ كه هانی مرۆڤی باوه‌ڕدار ده‌ده‌ن هه‌میشه له هه‌وڵی زیاد كردنی ئه‌و "هه‌ژاری"یه‌دا بێت، وه‌ك ئه‌و كه‌سه‌ی پتر ئیشتیهای خۆی ده‌جوولێنێت تاكو نیعمه‌تی زیاتر بچێژێت!

هه‌ر له‌م ڕوانگه‌یشه‌وه‌یه كه مرۆڤه كامڵه‌كانی ئه‌هلی ئیمان به شانازی‌یه‌وه باسی هه‌ژاریی خۆیان له به‌رده‌م خواوه‌نددا ده‌گێڕنه‌وه و لێی ده‌دوێن. به باشی ئاگاداری ئه‌م خاڵه به و، به پێچه‌وانه‌وه لێی تێ نه‌گه‌یت! چونكه مه‌به‌ستمان هه‌ست كردنه به "هه‌ژاری" و پیشاندانیه‌تی له به‌رده‌م خواوه‌ندی گه‌وره‌دا و پاڕانه‌وه‌ی هه‌میشه‌یی و بێ وچانه ته‌نها له ده‌رگانه‌ی ئه‌ودا. ده‌نا هه‌رگیز مه‌به‌ست ئه‌وه نی‌یه كه مرۆڤ هه‌ژاریی خۆی له به‌رده‌م خه‌ڵكی‌دا ده‌ربخات و لێیان بپاڕێته‌وه!

ئه‌و بلیت و ئه‌مره ئیداری‌یه‌ش: نوێژ و، فه‌رزه‌كان و، خۆپاراستنه له گوناهه گه‌وره‌كان.

– جا ئایا وایه؟

– به‌ڵێ وایه. چونكه هه‌موو پسپۆڕانی ئه‌م بواره و سه‌رجه‌م ئه‌هلی موشاهه‌ده و بینین و زه‌وق و كه‌شف (له ئه‌ولیا و صیددیق و زانایان و پیاوچاكان) هه‌موویان یه‌كده‌نگن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه:

ڕووناكی و توێشووی ئه‌و گه‌شته دووره ته‌نها له‌وه‌دایه مرۆڤ گوێڕایه‌ڵی فه‌رمانه‌كانی قورئانی پیرۆز بێت و دووره‌په‌رێزی له‌و شتانه بكات كه قورئانی پیرۆز داوای كردووه توخنیان نه‌كه‌وین..

ده‌نا هه‌رگیز نه زانست و، نه فه‌لسه‌فه و، نه حیكمه‌ت و، نه كارامه‌یی و لێهاتوویی، هیچ كامیان له‌م گه‌شته دوور و درێژه‌دا هیچ سوود و بایه‌خێكیان نی‌یه، به‌ڵكو تێكڕا تا چه‌ند هه‌نگاوێك و هه‌تا ده‌رگای "گۆڕ" دێن و ڕووناكی به مرۆڤ ده‌به‌خشن، ئنجا له‌وێ ده‌كوژێنه‌وه!

مادەم وایه ئه‌ی نه‌فسی ته‌مبه‌ڵم!

ئه‌وا باش بزانه كه گومان له‌وه‌دا نی‌یه به‌جێهێنانی پێنج فه‌رزه‌ی نوێژ و خۆپاراستن له حه‌وت گوناهه گه‌وره‌كان، تابڵێی كه‌م و ئاسان و ئیسراحه‌ت به‌خشن له چاو پێویستیی مرۆڤدا پێیان و له چاو سوود و به‌روبووم و ئاكامه‌كانیشیان.

جا ئەگەر هۆشمەند و وریا بیت، ئەوا بە باشی لەمە تێدەگەیت و حاڵی دەبیت.

کەواتە، ئەو کەسانەی کە بۆ فیسق و گوناهـ و خراپەکاری و بۆ لای شەیتانی پیسی فێتباز بانگت دەکەن، پێیان بڵێ:

- ئەگەر دەتوانن مردن لەناوبەرن و بیکوژن.. یان ئەگەر شتێکتان لە لایە کە بتوانن حقیقەوە لەناوچوون و فەوتان لە جیهاندا هەڵبگرن.. ئەگەر دەرمانێکتان لە لا دەست دەکەوێت کە بتوانن "بێ دەستەڵاتی" و "هەژاری"ی مرۆڤی پێ لەناو بەرن و، دەرگاکانی گۆڕستانیشی - بۆ هەتا هەتایی - پێ دابخەن..

ئەگەر ئەم شتانەتان لەلا هەیە، فەرموون دەریان بخەن و پیشانی ئێمەشی بدەن. دەنا بێدەنگ بن و دەمتان دابخەن!

چونکە ئەوەتا سەرجەمی بوونەوەران لەم مزگەوتە مەزنەی گەردووندا ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەخوێننەوە.. دەبا ئێمەش گوێیان لێ ڕابگرین و، دڵمان بە نووری ئەو قورئانە پیرۆزە ڕووناك بکەینەوە و، زمانیشمان بە یاد و خوێندنەوەی ئایەتەکانی پاراو بکەین.

بەڵێ، فەرمایشت هەر فەرمایشتی ئەو قورئانەیە. چونکە لە لایەن "حەق"ەوە هاتووە و، "حەق" گۆیە و، "حەق" دەردەخات و، بەڵگەکانی "نووری حیکمەت" بڵاو دەکاتەوە.

اللهم نَوِّرْ قلوبَنا بنورِ الإيمانِ والقرآن. اللهم أغْنِنَا بالافتقـــارِ إليـــك، ولا تُفقِرْنا بالاستغناءِ عنك. تبرأْنا إليك من حولنا وقوتنا والتجأنـــا إلى حولـــك وقوّتك، فاجعلْنا من المتوكلين عليك، ولا تَكِلْنـــا إلى أنفســـنا. واحفظنـــا بحفظك. وارحمنا وارحم المؤمنين والمؤمنات. وصلِّ وسلِّمْ على سيدِنا محمـــدٍ عبدِك ونبيِّك وصفيِّك وخليلك وجمالِ ملكك ومليكِ صنعك وعينِ عنـــايتك وشمسِ هدايتك ولسانِ حجتك ومثالِ رحمتـــك ونـــورِ خلقـــك وشـــرفِ موجوداتك وسراجِ وحدتك في كثرة مخلوقاتك وكاشفِ طِلْسمِ كائنـــاتك ودلاّلِ سلطنةِ ربوبيتك ومُبَلِّغِ مرضياتِك ومُعَرِّفِ كنوزِ أسمائك ومعلم عبـادك وترجمان آياتك ومرآة جمال ربوبيتك ومدار شهودك وإشـــهادك وحبيبـــك ورسولك الذي أرْسَلْتَهُ رحمةً للعالمين، وعلى آله وصحبه أجمعين وعلى إخوانه من النبيين والمرسلين وعلى ملائكتك المقربين، وعلى عبادك الصالحين. آمين.

# وتەی هەشتەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿أَللهُ لا إِلهَ إِلاّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ (البقرة:٢٥٥)

﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الإِسلامُ﴾ (آل عمران:١٩)

ئەگەر دەتەوێت تێبگەیت لەوەی کە دنیا چییە و، "گیان"ی ئادەمیزاد لە دنیادا چ رۆڵێکی هەیە و، نرخی ئایین بۆ مرۆڤ چییە و، ئەگەر ئایینی حەق(ئیسلام) نەبوایە چۆن دنیا دەبووە بەندیخانەیەکی سامناك و، بزانیت کە چۆن مرۆڤی خوانەناس بەدبەختترین زیندەوەرە.. هەروەها ئەگەر دەتەوێ تێبگەیت لەوەی کە ئەو شتەی نهێنی و گرێ کوێرەی سەرسوورهێنەری جیهان دەکاتەوە و "گیان"ی مرۆڤیش لە شەوەزەنگی تاریکی رزگار دەکات، تەنها: "يا أَللهُ" و "لا إله إلا الله"یە..

بەڵێ، ئەگەر حەز دەکەیت ئەمانە بزانیت و لێیان تێبگەیت، ئەوا سەیری ئەم کورتە چیرۆکە بکە و بە وردی بیری لێ بکەرەوە:

لە دێر زەماندا، دوو برا پێکەوە رۆشتن بۆ گەشتێکی دوور و درێژ.. ئەم دوانە رێیان گرتەبەر تاکو گەیشتنە دووریانێك، لەوێدا پیاوێکی جیددی و بە ویقاریان بینی. ئەمانیش لێیان پرسی:

– ئایا ئەم دوو رێگایە کامیان باشترە؟

ئەویش وتی:

– رێگای دەستە راست، پەیڕەوی کردنی ناچاریی یاسا و رێسای تێدایە، بەڵام ئەو پەیڕەوی کردنە ئاسایش و کامەرانیی بۆ ئەوانە تێدایە کە دەیگرنەبەر. رێگای دەستە چەپیش بێ یاسایی و بەرەڵایی و سەربەستیی تێدایە، بەڵام لە دووتوێی ئەو سەربەستییە رواڵەتییەدا رێڕەوانی ئەو رێیە دووچاری فەوتان و بەدبەختی دەبن.. ئێستاش خۆتان لە هەڵبژاردنی هەرکام لەو دوو رێگایەدا سەرپشك و سەربەستن.

پاش بیستنی ئـەم وتـە جوانانـە، بـرا ڕەوشـت باشـەکەیان، کـە پـڕ بـە دڵ حـەزی لـە پەیڕەوی کردنی یاسـا و ڕێسـا و ڕێکوپێکی بوو، ڕێگای ڕاسـتی گرتەبەر و، وتی: "توکلتُ على الله" و، کەوتەڕێ.. بەڵام بێچارە بەدڕەوشتەکەیان، ڕێگای چەپی بە باشـتر زانی، لەبەر ئارەزووی بەرەڵایی و سەربەستی کە لەو ڕێگایەدا هەبوو..

دەبا ئێمـەش بـە ئەندێشـە و خـەیاڵ شوێن پێی ئەم پیاوەیـان هـەڵبگرین کـە ڕێگایـەکی بـە ڕوالـەت سووك و ئاسانی گرتەبەر، ئەو ڕێگایەی کە لـە ڕاستیدا تابلـێی گـیروگرفت و دەردیسەری و ماندووبوونی لە دوو توێ دایە، تاکو بزانین چیی بەسەر دێت.

ئەم پیاوە، پاش ئەوەی شیو و دۆڵە قووڵ و بەرزاییـە سـەختەکانی ڕێگـای بڕی، گەیشتە دەشت و بیابانێکی سامناك. لە ناکاودا دەنگێکـی ترسناکی بیست، کـە ئـاوڕی لـێ دایـەوە شێرێکی دڕی گەورەی بینی کە لەناو دارستانێکی چڕەوە بەرەو ڕووی دەهـات! یەکسـەر بـە ترس و لەرزەوە لەبەری هەڵهات، تا گەیشتە لێواری بیرێکی وشك کـە بـە ئـەندازەی شەسـت گەز قووڵ بوو. لە ناچـاریدا خـۆی هاویشتە نـاو بیرەکـەوە بۆ ئـەوەی لـە دەسـت ئـەو شێرە ڕزگاری بیێت. لە کاتی بازدان و پێش ئەوەی بگاتە بنکی بیرەکە دەستی لە درەختێك گیربوو کە بە دوو لق ڕەگەوە لـە دیـواری بیرەکـەدا ڕوابـوو، یەکسـەر خـۆی پێـوە ڕاگـیر کـرد. هـەر هێندەی کە بە درەختەکەوە گیرسایەوە و دەوروبەری خۆی بە باشـی بینـی، سـەیری کـرد دوو مشك، یەکێکیان ڕەش و ئەوی تریان سپی، بەردەوام بە دانە تیژەکانیان و لـەسەرخۆ خـەریکی قرتاندنی ئەو دوو ڕەگەی درەختەکە بوون!

پاشـان سـەیرێکی سـەرەوەی کـرد، بینیی وا شێرەکە وەك پاسـەوان لـــە دەمـی بیرەکـەدا وەستاوە.. کە سەیری خوارەوەشـی کـرد هەژدیهایـەکی گـەورەی لـە بنکی بیرەکـەدا چاو بەکەوت کە لە نزیکەی سـی گـەز دووریـیەوە سـەری هـەڵبڕیبوو دەیویسـت لـێی نزیـك ببێتەوە و، دەمیشی بە فراوانیی بیرەکە کردبـووەوە و چاوەڕوانی ئەو سـاتەی دەکـرد کـە ئـەم بەربێتەوە بەرەو خوارەوە و ئەویش قووتی بدات!

سـەرەڕای ئەمانـە، چـەندین مێرووی گـەزندە و ژەهراویـی جۆراوجۆریـش وەك بازنـەی دەست دەوریان لـێ دا.

پاشان سەیری لای سەرەوەی درەختەکەی کرد، بینیی ئـەم درەختـە لـە ڕوالـەتدا درەختـی هەنجیرە، کەچی بە شێوەیەکی دەراسا گەلـێ جـۆری جیاجیـای میوەی وەك گوێـز و هـەنار و شتی تری لەو جۆرەی گرتووە!

ئەم پیاوەش، بەهۆی تێنەگەیشتن و نەفامیی خۆی، نەیدەزانی کە ئـەم شتانەی دەیـانبینێت ئاسـایی نـین و، هـەرگیز ناگونجـێ بـە ڕێکـەوت و بـێ مەبەسـت هاتبنـە کایـەوە و، لـەوە

تێنه‌ده‌گه‌یشت كه ئه‌م كاروباره سه‌یرانه هۆكارێكیان هه‌یه و ده‌بێ له پشتی ئه‌م شتانه‌وه یه‌كێك ببێت به‌ڕێوه‌یان ببات و ڕێكیان بخات..

له‌به‌ر ئه‌وه، هیچ به‌لامانه‌وه سه‌یر نی‌یه كه "دڵ"ی ئه‌م مرۆڤه بناڵێنێت و "گیان"ی هاوار بكات و "ژیری"شی له به‌رامبه‌ر ئه‌م باره ناهه‌موار و ئازاربه‌خش و سه‌رسووڕهێنه‌رانه‌ی گرفتاریان بووه ده‌سته‌وسان بمێنێت.

له‌گه‌ڵ ئه‌مانه‌شدا، ده‌روونی به‌دخوازی ئه‌م كابرایه، وه‌ك بڵێی هیچ شتێك ڕووی نه‌دابێت و هیچ گیروگرفتێكیش تووشی "دڵ" و "گیان" و "ژیری"ی ئه‌و نه‌بووبێت، هه‌موو ئه‌وانه‌ی فه‌رامۆش كرد و په‌لاماری میوه‌ی دره‌خته‌كه‌ی دا و به بێ سێ و دوو كردن ده‌ستی دایه خواردنی ئه‌و به‌روبوومانه، هه‌رچه‌نده‌ش هه‌ندێكیان ژه‌هراوی و كوشنده بوون. ئه‌مه‌ش ته‌نها له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه گوێی خۆی له‌تاو هاوار و ناڵه‌ی "دڵ"ی ئاخنێت و، ده‌نگی داد و فریادی دڵ و گیان و ژیریی نه‌بیستێت!

به‌م جۆره، ئه‌م مرۆڤه به‌دبه‌خته به پێی فه‌رمووده‌ی قودسیی: "أنا عند ظن عبدي بـــي"(١) ڕه‌فتاری له‌گه‌ڵ كرا! واته: به‌نده‌ی خۆم چۆنم لێ تێ بگات، به‌و جۆره مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵ ده‌كه‌م..

به‌ڵێ، ئه‌و مرۆڤه به‌دبه‌خت و كه‌م فامه، وه‌ك چۆن پێویست بوو، هه‌ر به‌و جۆره ڕه‌فتاری له‌گه‌ڵ كرا و هه‌ر به‌و جۆره‌ش مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵ ده‌كرێت، له تۆڵه‌ی ئه‌وه‌ی كه هه‌موو شتێكی به ئاسایی و بێ ئامانج و بێ مه‌به‌ست ده‌زانی، كه ئه‌وه‌ش ئه‌نجامی بێ‌ئاگایی و به‌دگومانیی خۆی بوو.

به‌م چه‌شنه، كه‌وته ناو ئاگری سزا و ئازاره‌وه، نه ئه‌وه بوو بمرێت و له‌و ئازار و سزایه ڕزگاری ببێت، نه ده‌یشی توانی ژیانی به شادمانی به‌سه‌ر به‌رێت!

وا ئێمه‌ش له لایه‌نی خۆمانه‌وه ئه‌و نه‌گبه‌ته به‌جێ ده‌هێڵین، با له سزا و ئازاری خۆیدا بتلێته‌وه و، به ڕێگای خۆماندا ده‌گه‌ڕێینه‌وه تاكو بزانین براكه‌ی چیی به‌سه‌ر هات؟

ئه‌م پیاوه پیرۆز و هۆشمه‌نده بێ وچان ڕێی ده‌بڕی، بێ ئه‌وه‌ی وه‌ك براكه‌ی تووشی ئه‌شكه‌نجه و ئازار ببێت. ئه‌میان له‌به‌ر ڕه‌وشت جوانیی خۆی، ته‌نها بیری له شتی جوان ده‌كرده‌وه و خه‌یاڵ و ئه‌ندێشه‌ی ته‌نها بۆ لای شتی جوان ده‌ڕۆیشت. له‌به‌ر ئه‌وه، هه‌میشه شادمان و دڵخۆش بوو. ئنجا وه‌ك براكه‌شی ته‌گه‌ره و ناخۆشیی ئه‌وتۆی نه‌ده‌هاته ڕێ، چونكه له یاسا و ڕێسا شاره‌زا و ئاگادار بوو هه‌روه‌ك هه‌موو شتێكیشی به گوێره‌ی په‌یڕه‌وی كردنی یاسا جێ به‌جێ ده‌كرد، ئیتر هه‌موو كاروبارێكی به ئاسانی ده‌هات به ده‌سته‌وه و، به سه‌ربه‌ستی ڕێگای خۆی ده‌بڕی و هێمنی و ئارامی هه‌موو سووچێكی دڵی پڕ كردبوو..

---

(١) رواه البخاري ومسلم والترمذي. (وه‌رگێڕ)

بەم جۆرە، لە ڕۆشتندا بەردەوام بوو هەتا گەیشتە باخچە و بێستانێك كە بە میوە و گوڵ ڕازابووەوە، لەم لا و ئەو لای باخچەكەشدا، بەهۆی بایەخ نەدان بە پاك و خاوێنیی ئەو باخچەیە، هەندێ لاكی زیندەوەران و شتی بۆگەن و ڕزیو پەرش و بڵاو بووبوون..

خۆ برا بەدبەختەكەش - پێش ئەم - ڕێی كەوتبووە ناو ئەو جۆرە بێستانانەوە، بەڵام خۆی بە تەماشا كردنی لاكی بۆگەنەوە خەریك كردبوو، تا لە ئەنجامدا هەستی بە گێژبوون و دڵتێكچوون كردبوو، ناچار ئەو بێستانانەی بەجێ هێشتبوو، بێ ئەوەی كەمێك بحەسێتەوە تاكو بتوانێت لە گەشتەكەیدا بەردەوام بێت..

بەڵام ئەمیان بەپێی ئەو دەستوورەی كە دەڵێت: (لە هەموو شتێكدا سەیری چاكترین و جوانترینیان بكە) لاكە بۆگەن و شتە ڕزیوەكانی فەرامۆش كرد، تەنانەت هەر ئاوڕیشی لێ نەدانەوە و، بۆ خۆی سوودێكی باشی لە میوە و شتە باشەكانی ناو بێستانەكە وەرگرت. پاش ئەوەی كە بە ئارەزووی خۆی حەسایەوە، هەڵسا و ڕێی گرتەبەر.

ئەمیش، وەك براكەی، ڕێی كەوتە ناو بیابانێكی بەرین و دەشتاییەكی فراوانەوە. هەروەكو ئەویش، لە ناكاودا دەنگی شێرێكی بیست كە هەڵمەتی بۆ دەهێنا، ئەمیش، وەك براكەی، ترس و بیم دایگرت و سامی لێ نیشت، بەڵام كەمتر لە چاو ترس و سامی براكەی، چونكە بەهۆی بیركردنەوەی جوان و گومانی پاكی، بە جوانی بیری كردەوە و لەبەر خۆیەوە وتی:

- (دیارە ئەم بیابانە فەرمانڕەوایەكی هەیە. كەواتە دەبێ ئەو شێرە خزمەتگوزارێكی گوێڕایەڵی ژێر دەستی ئەو فەرمانڕەوایە بێت).

بەمە دڵنیایی ڕووی تێ كرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە دەست شێرەكە هەڵهات و ڕای كرد، تا گەیشتە لێواری بیرێكی وشك كە شەست گەز قووڵ بوو. ئەمیش، وەك براكەی، لە ترسی شێرەكە خۆی هاویشتە ناو بیرەكەوە، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە بنكی بیرەكە دەستی لە درەختێك گیر بوو، بەكسەر خۆی پێدا هەڵواسی. سەیری كرد وا دوو زیندەوەر پەیتا پەیتا هەردوو لقی ڕەگی درەختەكەیان دەقرتاند.. پاشان كە سەیری سەرەوەی كرد، شێرەكەی بینی كە لە دەمی بیرەكەدا ڕاوەستابوو.. ئنجا سەیری خوارەوەی كرد هەژدیهایەكی لە بنكی بیرەكەدا بینی.. كە سەیری خۆی كرد بینیی لە بارێكی سەیر و سەرسووڕهێندایە و، گەلێ حەپەسا، بەڵام بە سەدان جار لە حەپەسانی براكەی كەمتر، چونكە ڕەوشتە جوانەكانی بیركردنەوەی جوانیان پێ بەخشیبوو، كە ئەمەش لایەنە جوانەكانی هەموو شتێكی پیشان دەدا..

لەبەر ئەمە، بیری كردەوە كە ئەم شتە سەرسوورهێنەرانە پەیوەندی‌یان لەگەڵ یەكتردا هەیە و، وا دەردەكەوێت كە یەكێك هەیە بیانبزوێنێت و، دەبێ ئەم كاروبارە سەرسوورهێنەرانە نهێنی‌یەكی شاراوە و تەلیسمێكی داخراویان تێدا بێت:

- (بەڵێ، هەموو ئەم شتانە دەگەڕێنەوە بۆ فەرمانی فەرمانڕەوایەكی نادیار، كەواتە من لێرەدا تەنیا نیم، بەڵكو ئەو فەرمانڕەوا نادیارە دەمبینێت و پارێزگاریم دەكات و، بۆ ئەنجام و مەبەستێكی تایبەتی تاقیم دەكاتەوە و، بۆ كوێ بیەوێت دەمبات)!

لەم بیركردنەوە جوانەدا شەوق و تاسەیەكی تێدا پەیدا بوو كە ئەم پرسیارەی هێنایە كایەوە:

- ئایا دەبێ ئەو كەسە كێ بێت كە بەم جۆرە تاقیم دەكاتەوە و دەیەوێت خۆیم پێ بناسێنێت و لەم ڕێبازە سەیرەوە بەرەو ئەنجامێكی دیاری كراو دەمبات؟!

خۆشەویستیی خاوەنی نهێنی‌یەكە لە حەزكردنی ناسینیەوە دروست بوو.. لەو خۆشەویستی‌یەشەوە حەزی شیكردنەوەی ئەو نهێنی‌یە گەشەی كرد.. لەم حەزەیشەوە ئارەزووی وەرگرتنی بارێكی شیاوی گونجاو بەرامبەر خاوەنی ئەو نهێنی‌یە و بۆ دەستكەوتنی ڕەزامەندیی ئەو، لە دەروونی‌دا پەیدا بوو..

پاشان سەری هەڵبڕی و سەیرێكی درەختەكەی كرد، بینیی ئەم درەختە بە ڕواڵەت دار هەنجیرە، كەچی هەزاران جۆر میوەی ڕەنگاوڕەنگی گرتووە! هەر كە ئەمەی بینی یەكسەر ترسەكەی بە تەواوی ڕەوی‌یەوە. چونكە بۆی ڕوون بووەوە كە ئەم دارهەنجیرە لیستە و پێرست و پیشانگایەكە فەرمانڕەوای نادیار، بەو شێوە سەیرە، نموونەی پێكهاتووەكانی ڕەز و باخچە و بێستانەكانی خۆی لێرەدا داناوە و ئەم درەختەی پێ ڕازاندووەتەوە بۆ پیشاندان و دەرخستنی ئەو لەزەت و خۆشی‌یانەی كە لە باخچەكانی‌دا بۆ میوانەكانی خۆی ئامادەی كردوون. دەنا تەنها درەختێك هەرگیز بەروبوومی هەزاران درەخت ناگرێتە خۆ..

ئیتر ئەم مرۆڤە كە گەیشتە ئەم دەرەنجامە، هیچی بۆ نەمایەوە لە نزا و پاڕانەوە زیاتر، بۆیە بە سەركزی و ملكەچی‌یەوە هێندە پاڕایەوە هەتا كلیلی نهێنی‌یەكەی ئیلهام كرا و، وتی:

- "ئەی فەرمانڕەوای ئەم هەرد و دەشت و بیابانە! وا پەنام بۆ هێنایت و لێت دەپاڕێمەوە، من خزمەتگوزارێكی تۆم و، تەنها ڕەزامەندیی تۆم دەوێت، داوات دەكەم و لە دووت دەگەڕێم".

یەكسەر پاش ئەم پاڕانەوەیە دیواری بیرەكە لە شێوەی دەرگایەكدا لەسەر سەوزایی و باخچەیەكی فراوانی جوان و بێ گەرد كرایەوە. دوور نی‌یە هەر دەمی هەژدیهاكە بوو بێت بە دەرگا و لێی خرابێتە سەرپشت..

شێر و هەژدیهاکەش وەك دوو خزمەتگوزاریان لێ هات و خولکیان دەکرد بۆ ناو باخچەکە، تەنانەت شێرەکە لەبەر دەستیدا شێوەی ئەسپێکی ئامادە و زین کراوی لەخۆ گرت!

دەسا ئەی دەروونی تەمبەڵم!

ئەی ئەو کەسەی کە لەم گەشتە ئەندێشەیی‌یەدا هاورێم بووە!

وەرن با پێکەوە بەراوردێکی حاڵی ئەم دوو برایە بکەین و بزانین چۆن کردەوەی چاك چاکەی لە دوایە و، هی خراپیش هەر ئەنجامی خراپی لێ دەبێتەوە:

سەیر بکەن! ئەو برا بەدبەختەی کە بە لای چەپدا ڕۆشت، وا ئێستا ترس و سامی ئەوەی لێ نیشتووە کە هەر کاتێك بێت - چ ئێستا و چ تاوێکی تر - دەکەوێتە ناو دەمی هەژدیهاکەوە!.. بەڵام بەختەوەرەکەیان بۆ میوانیی باخچەیەکی ڕازاوە و پڕ لە میوەی ڕەنگین بانگ کراوە.

هەروەها ئەو بەدبەختە لە ترس و سامدا وەختە دڵی لەت لەت ببێت.. بەڵام ئەم بەختەوەرە شتی سەیر و سەرسووڕهێنەر دەبینێت و هەست بە ترسێکی لەزەت بەخش دەکات و، بە چاوی پەند و ئامۆژگاری و ناسینێکی خۆشەویستانەوە بۆیان دەڕوانێت.

ئەو بەدبەختە هەژارە، ئازاری بێ هاودەمی و دڵتەنگی و نائومێدی دەچێژێت.. لە کاتێکدا کە ئەم بەختەوەرە لە ناوەندی چێژ و لەزەتی هیوا و شەوق و تاسە و دڵنیاییدا دەژی.

ئەو نەگبەتە، خۆی وەك بەندکراوێك دەبینێت و، وا دەزانێت بەوە حوکم دراوە کە دڕندەکان پەلاماری بدەن.. لە کاتێکدا ئەم کامەرانە، لەبەر ئەوەی میوانی کەسێکی تابڵێی بەخشندە و دەست ڕەنگینە، وەك میوانێکی بەڕێز و ئازیز کات بەسەر دەبات و لەگەڵ خزمەتگوزارەکانیدا دەژی و تەمەنی خۆش و بەپیت دەگوزەرێنێ و دڵی پێیان دەکرێتەوە.

ئەو بەدبەختە بە ویستی خۆی و بەهۆی خواردنی ئەو خواردەمەنییانەی کە لە ڕواڵەتدا بەلەزەت و لە ناوەڕۆکدا ژەهراوی بوون، بەرەو سزا هەنگاو دەنێت، چونکە ئەو میوە و خواردەمەنییانە وەك "نموونە" دانراون و تەنها ڕێی ئەوە دراوە کە لێیان بچێژرێ، تاکو ئەو کەسەی لێیان دەچێژێت ببێتە داواکاری سەرچاوە و کانگا ڕەسەنەکانیان و بیاندۆزێتەوە. نەك ڕێ بەوە نەدراوە کە چەشنی ئاژەڵ بە چڵێسی هەڵمەتیان بۆ ببات و بێ سێ و دوو کردن و لێکدانەوە دەست بە خواردن و هەڵلووشینیان بکات..

به‌ڵام ئه‌م مرۆڤه شادمانه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له ڕاستیی ڕووداوه‌كه گه‌یشتووه، ئه‌وا كه‌میان لـێ ده‌چێژێت و، خواردنیـان بـۆ كـاتی خـۆی دوا ده‌خـات و، تـام و لـه‌زه‌ت لـه‌و چاوه‌ڕوانی‌یـه‌دا ده‌بینێت.

پاشان ئه‌و به‌دبه‌خته، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی چاوی به‌سیره‌تی كوێرایی داهـاتبوو، ئـه‌و ڕاسـتی و شـته سه‌یر و جوانانه‌ی نه‌ده‌بینی كه وه‌ك خۆر ئاشكران و، به ده‌ستی خۆی سته‌می له خۆی كـرد و خۆی هاویشته بارێكی ناهـه‌موار و ئه‌ندێشـه‌یه‌كی تـاریكی دۆزه‌خ ئاسـاوه، نـه ئه‌وه‌یـه شایانی بـه‌زه‌یی بێـت و، نـه ئه‌وه‌شـه كـه مـافی گلـه‌یی ببێـت! وه‌ك ئـه‌وه‌ی پیـاوێك لـه‌ناو دۆسـت و خۆشه‌ویستانی خۆی له وه‌رزی هاوین و له‌ناو باخچه‌یه‌كی خه‌مڵاودا و له گه‌رمه‌ی ئاهه‌نگی خۆشـی و شـادی‌دا، بـه هیـچ كـام له‌مانـه قـایل نـه‌بووبێت و، پێـك لـه دوای پێـك ده‌سـتی بـه خواردنـه‌وه‌ی مـه‌ی كردبێ، هـه‌تا مه‌سـت بووبێـت، ئنجـا ده‌ستی بـه هـاوار و ناڵـه و گریـان كردبێت و، وای زانیبێت كه به ڕووت و قووتی و برسێتی له چلـه‌ی زستاندایه و كه‌وتووه‌تـه ناو چه‌ندین جڕ و جانه‌وه‌ری دڕنده‌وه! جا هه‌روه‌ك ئه‌و كه‌سه شایانی سۆز و به‌زه‌یی نی‌یه، ئه‌م نه‌گبه‌تـه‌ی چیرۆكه‌كـه‌شمان بـه هـه‌مان جـۆره، چونكـه بـێ ئـه‌وه‌ی كـه‌س زۆری لـێ كردبێت، كه‌چی به ویستی خۆی سته‌م له خۆی ده‌كات و هاوڕێیانی خۆی له به‌رچاو ده‌كـه‌وێت و بـه جڕ و جانه‌وه‌ر و دڕنده‌یان له قه‌ڵه‌م ده‌دات!

به‌ڵام ئه‌م مرۆڤه شادمانه، به چاوی خۆی "ڕاستی" ده‌بینێت. خۆ "ڕاستی"یـش لـه خـۆی‌دا شتێكی تابلـێی دڵگیر و جوانه، ئنجا له‌گه‌ڵ دۆزینه‌وه و هه‌ست پێكردنی "ڕاستی"شـدا ڕێـزی كه‌ماڵ و جوانیی خاوه‌نی "ڕاستی" ده‌گرێت و، به‌م پێیه شایانی میهره‌بانی و به‌خشنده‌یی ئـه‌و ده‌بێت.

كه‌واته ئه‌ی ده‌روونی خۆم و ئه‌ی هاوڕێكه‌شم له‌م گه‌شته ئه‌ندێشه‌یی‌یه‌دا!

له ڕوانگه‌ی ئه‌م نموونه‌یه‌وه، یه‌كێك له نهێنی‌یه‌كانی ئایه‌تی: ﴿**ما أَصابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِــنَ الله وما أَصابكَ من سيئةٍ فَمِن نفسكِ**﴾ (النساء:٧٩) بزانه و تێبگه و هه‌ستی پێ بكه.

واته: شتانی فانی و بێ كـه‌ڵك له‌خۆته‌وه‌یـه و، شـته بـاش و سوودبه‌خشـه‌كانیش لـه خـوای گه‌وره‌وه‌یه!

ئه‌گه‌ر ئه‌م جیاوازی‌یانه و هاوچه‌شنی ئه‌مانـه بـه‌راورد بكـه‌یت و لێكیـان بده‌یتـه‌وه، بـۆت ڕوون ده‌بێتــه‌وه كــه ده‌روونی هــانده‌ری خــراپكاری (النفس الأمارة بالسوء) دۆزه‌خێــكی مـه‌عنه‌ویی بۆ یه‌كـه‌میـان ئاماده كـردووه.. به‌ڵام ئه‌وی تریان - له‌به‌ر پاكیی خـۆی و، جوانیـی نیاز و ڕه‌وشت و، به‌رزیی بیركردنه‌وه‌كانی - لێشاوی به‌ره‌كه‌ت و چاكه‌ی زۆر و به‌ختیاریی به‌سه‌ردا ده‌ڕژێت و ڕه‌فتاری به‌رز و پرشنگداری پێ ده‌به‌خشرێت.

کەواتە ئەی نەفسەکەم!

ئەی ئەو کەسەی کە لەگەڵ مندا گوێی لەم چیرۆکە ڕاگرتووە!

ئەگەر ناتەوێت وەك ئەو برا نەگبەتەیان بیت و، حەزت لەوەیە وەك برا بەختەوەرەکەیان بیت، ئەوا گوێ بۆ قورئانی پیرۆز ڕابگرە و، مل بۆ حوکم و فەرمانەکانی کەچ بکە و، دەستی پێوە بگرە و، بەپێی فەرمانەکانی کاروبارەکانت ئەنجام بدە.

خۆ ئەگەر بە تەواوی ڕاستییەکانی ئەم چیرۆکە بچووکەت وەرگرتبێت، ئەوا دەتوانیت هەموو ڕاستییەکی ئایینی و مرۆڤایەتی و ئیمانیی لەسەر دەستنیشان و پیادە بکەیت. وا من سێ بنەڕەتی و سەرەکییەکانت پێ دەڵێم، تۆیش لە لایەنی خۆتەوە خاڵە وردەکانی دەربهێنە و بیاندۆزەرەوە:

ئەو دوو برایە، یەکێکیان: "گیان"ی ئیماندار و "دڵ"ی پیاوچاکە.. ئەوی تریان: "گیان"ی کافر و "دڵ"ی مرۆڤی فاسقە..

ڕێگای لای ڕاستیان: ڕێبازی قورئان و شاڕێگای ئیمانە.. ڕێگای لای چەپیش: ڕێبازی کوفر و یاخی بوونە..

ئەو باخ و بێستانەی سەر ڕێگاکەش: ئەم ژیانە کۆمەڵایەتی و کاتییەی کۆمەڵی مرۆڤایەتی و شارستانێتیی ئادەمیزادە، کە لە یەك کاتدا باش و خراپ، خێر و شەڕ، پاك و پیسی تێدایە..

مرۆڤی ژیر لە جێگایەکی وادا بەپێی دەستووری: "خُذْ ما صفا، دَعْ ما كدر" ڕەفتار دەکات و، هەر شتێك ساغی و سەلامەتیی دڵ و دەروون و دڵنیایی ویژدانی تێدا بێت، لەگەڵ ئەودا دەبێت..

ئەو بیابانەش: ئەم دنیا و سەرزەوییەی خۆمانە کە تیایدا دەژیین..

ئەو شێرەش: مردن و ئەجەلی مرۆڤە..

ئەو بیرەش: لەش و جەستەی ئادەمیزاد و سەردەم و کاتی ژیانیەتی، قووڵییە شەست گەزییەکەی بیرەکەش: ئاماژەیە بۆ تێکڕای تەمەن کە شەست ساڵە..

ئەو درەختەش: ماوەی تەمەن و ماددەی ژیانی ئادەمیزادە..

ئەو دوو گیانلەبەرە ڕەش و سپییەش: شەو و ڕۆژن لە تەمەنی مرۆڤدا..

مەبەست لە دەمی هەژدیهاکەش: دەمی "گۆڕ"ە کە دەرگایەکە لە ڕووی بەرزەخ و ژیانی ئاخیرەتدا دەکرێتەوە، ئەوەندە هەیە کە ئەو دەمە بۆ مرۆڤی ئیماندار دەرگایەکە پیایدا تێپەڕ دەبێت، کاتێ لە بەندیخانەی دنیاوە بەرەو باخچە و بێستانەکانی بەهەشتی بەرین دەڕوات و هەنگاو دەنێت..

ئه‌و مێرووه زیانبه‌خشانه‌ش: گیرو گرفت و به‌ڵاكانی ژیانی دنیان. ئه‌وه‌نده هه‌یه بۆ مرۆڤی ئیماندار هۆكارێكی شیرینی بێدار كردنه‌وه‌ی خواوه‌ندن و، ئاوڕدانه‌وه‌ی په‌روه‌ردگارن له به‌نده‌كانی خۆی، تاكو هه‌رگیز "بێ ئاگایی" به سه‌ریاندا زاڵ نه‌بێت..

به‌روبوومه هه‌مه چه‌شنه‌كانی ئه‌و دره‌خته‌ش: نیعمه‌ته‌كانی دنیان كه په‌روه‌ردگاری گه‌وره و سه‌خاوه‌تمه‌ند دروستی كردوون، بۆ ئه‌وه‌ی وه‌ك لیسته و نـاوه‌رۆكێك وابن بۆ نیعمه‌ته‌كانی ئاخیره‌ت و یادی نیعمه‌ته‌كانی ئه‌وێیان پێ بكرێته‌وه و، خواوه‌ندی دانا بۆ بانگێشتی كڕیاره‌كانی میوه‌ی به‌هه‌شت له شێوه‌ی چه‌ند نموونه‌یه‌كدا به‌دیی‌هێناون. ئه‌و هه‌موو میوه جۆراوجۆرانه‌ش كه خوا به‌و دره‌خته‌ی به‌خشیبوو، په‌نجه بۆ مۆركی "صه‌مه‌دانییه‌ت"ی خوا و ته‌مغه‌ی "په‌روه‌ردگاریتی" و فه‌رمانڕه‌وایه‌تی "ده‌سته‌ڵاتی" ئه‌و درێژ ده‌كه‌ن..

چونكه (دروستكردنی هه‌موو شتێك له ته‌نها یه‌ك شت) وه‌ك پێكهێنانی هه‌موو جۆره‌كانی ڕووه‌ك و به‌روبوومه‌كانیان له ته‌نها یه‌ك گڵ و، دروستكردنی هه‌موو زینده‌وه‌ران له یه‌ك ئاو و، داهێنانی ئامێره‌كانی زینده‌وه‌رانیش له خۆراكێكی ساكار.. هه‌روه‌ها (دروستكردنی ته‌نها یه‌ك شت له هه‌موو شتێك) وه‌ك دروستكردنی گۆشتێكی تایبه‌تی و پێستێكی ئاسایی بۆ زینده‌وه‌ران له چه‌ندین جۆر خۆراكی هه‌مه چه‌شن و جیاواز..

هه‌موو ئه‌مانه، سكه و ته‌مغه‌ی كه‌سێكی "صه‌مه‌د" و تاك و ته‌نیا و، مۆری تایبه‌تیی پادشای ئه‌زه‌ل و ئه‌به‌دن كه هه‌رگیز به كه‌س لاسایی ناكرێنه‌وه.

به‌ڵێ، داهێنانی یه‌ك شت له هه‌موو شتێك و، به‌دیهێنانی هه‌موو شتێكیش له ته‌نها یه‌ك شت، تایبه‌تكارییه‌كی سه‌ربه‌خۆی به‌دیهێنه‌ری هه‌موو شتانه و، به‌ڵگه‌یه‌كی تایبه‌تیی ئه‌و خواوه‌نده‌یه كه به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا به‌توانا و زاڵ و به‌ده‌سته‌ڵاته.

ئه‌و نهێنییه‌ش، نهێنیی دانست و ئامانجی به‌دیهاتنی بوونه‌وه‌رانه، كه ته‌نها به‌هۆی نهێنیی ئیمانه‌وه ده‌كرێته‌وه. ئه‌و كلیله‌ش كه ده‌یكاته‌وه: ﴿ **أَللهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هوَ الْحَيُّ القَيّوم** ﴾ و (یا الله) و (لا إِلَهَ إِلاّ الله)یه.

گۆڕانی ده‌می هه‌ژدیهاكه و بوونی به ده‌رگای باخچه و بێستان، هێمای ئه‌وه‌یه كه: "گۆڕ" به‌ندیخانه‌ی دڵته‌نگی و له‌بیرچوون و فه‌رامۆش كردنه و، بۆ گومڕایان و سته‌مكاران وه‌كو ناوسكی هه‌ژدیها وایه.. به‌ڵام بۆ ئه‌هلی ئیمان و قورئان ده‌رگایه‌كه خراوه‌ته سه‌رپشت تاكو له به‌ندیخانه‌ی ئه‌م ژیانه‌وه به‌ره‌و باخچه و گوڵزاره‌كانی ژیانی نه‌مری و هه‌میشه‌یی و، له كۆڕی تاقیكردنه‌وه‌ی دنیاوه بۆ خۆشی و كامه‌رانیی به‌هه‌شت و، له ده‌ردی سه‌ریی ئه‌ركی ژیانه‌وه بۆ ژێر سایه‌ی به‌خشنده‌یی خوای گه‌وره‌ی میهره‌بان بڕۆن.

گوزان و بوونی ئەو شێرە دڕندەیەش بە ئەسپێکی ئامادە کراوی خزمەتگوزار، هێمایە بۆ ئەوەی کە: "مردن" بۆ گومڕایان جودایی و لێکبڕانێکی سزادەری هەتاهەتایی یە لە هەموو دۆست و خۆشەویستان و، بەجێهێشتنی بەهەشتێکی درۆینە و هەڵخەڵەتێنەری وەك دنیایە، بۆ تەنگی و تەسکیی بەندیخانەی تەنیایی ناو گۆڕ و، ون بوون و، سەر لێ شێوانێکی بێ سنوور.. بەڵام بۆ ئەهلی هیدایەت و قورئان، گەشتێکە بەرەو جیهانی دوایی و هۆکارێکی گەیشتنە بە خۆشەویستان و هاوڕێیانی دێرین و، هۆیەکە بۆ چوونە ناو نیشتمانی حەقیقە و بەختیاریی هەمیشەیی و، خوڵك و بانگ کردنێکی بەڕێزانەیە بۆ دەربازبوون لە زیندانەی دنیا بەرەو باخچەکانی بەهەشت و، چاوەڕوانییەکە بۆ وەرگرتنی پاداشتی خزمەتگوزارییەکان لە لایەن میهرەبانیی خوای گەورەوە و، حەسانەوەیەکە لە ئەرك و ئەرکی سراوییەکانی ژیان و پشوودانێکە لە فەرمانبەرییەکانی و، ڕاگەیاندنێکە بۆ کۆتایی پێ هێنانی ئەرکەکانی بەندایەتی و تاقیکردنەوەکانی فێربوون لەم ژیانەی دنیادا.

**لە هەموو ئەمانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

هەر کەسێك ژیانی دنیای فانی بکات بە ئامانج و مەبەستی خۆی، ئەوا هەر ئەم ژیانەی (لە ڕاستی و ناوەڕۆکدا) بۆ دەبێت بە دۆزەخێکی دڵ سووتێنەر، با لە ڕواڵەتیشدا لە خۆشی و خۆشگوزەرانیی نیعمەتدا بێت.. بەڵام ئەو کەسەی ڕوو بکاتە ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەی ئەودنیا و بە ڕاستی و دڵسۆزی تێبکۆشێت و هەوڵی بۆ بدات و بۆی لێ ببڕێت، ئەوا کامەرانی و بەختیاریی هەردوو لای دەستگیر دەبێت و شایانی هەردووکیان دەبێت، با ئەم دنیایەشی لە بەرچاودا تەسك و خراپ و ناخۆش بێت، بەڵام ئەم بەلایەوە خۆش و شیرین دەبێت و لەبەر ئەوەیدا دەبێت بە هۆڵی چاوەڕوانیی بەهەشتی بەرین. لەبەر ئەوە، ئارام دەگرێت و هەمیشە بە شوکرانەبژێری و سوپاسی پەروەردگاری خۆیدا دەبێت.

اللهم اجعلنا من أهل السعادة والسلامة والقرآن والإيمان. آمين.

اللهم صل وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه، بعدد جميع الحروفات المتشكلة في جميع الكلمات المتمثلة بإذن الرحمن في مرايا تموجات الهواء عند قراءة كل كلمة من القرآن من كل قارئ من أول النزول الى آخر الزمان.

وارحمنا ووالدينا وارحم المؤمنين والمؤمنات بعددها، برحمتك يا أرحم الراحمين.

آمين والحمد لله رب العالمين.

# وتەی نۆهەم

بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿فسبحانَ الله حين تُمسون وحين تُصبحون ۞ ولە الحمدُ في السموات والأرضِ وعشيّاً وحين تُظهِرون﴾** (الروم:١٧-١٨)

ئەی برای بەڕێزم!

پرسیبووت کە: "حیکمەت" لە دەستنیشان کردنی ئەو پێنج کاتە دیاریکراوانەی نوێژدا چی‌یە؟

ئێمەش ئاماژە بۆ تەنها حیکمەتێك دەکەین لە نێوان ئەو دانستە زۆرانەی کە لە دیاری کردنی ئەو پێنج کاتانەدا هەن:

بەڵێ، هەروەك کاتی هەموو نوێژێك سەرەتای ئالوگۆڕێکی گەورە و گرنگە لە "زەمان"دا، لە هەمان کاتیشدا ئاوێنەیەکە نیعمەتە هەمەکی‌یەکانی خوای گەورەی تێدا دەردەکەوێت.

لەبەر ئەوە، خوای گەورە فەرمانی بە نوێژ کردن داوە لەو کاتانەدا. واتە فەرمانی بەوە داوە کە بەندەکانی تەسبیحات و ڕێز لێگرتنی خوای گەورەی بالا دەست زیاتر بکەن. هەروەها شوکر و ستایشی نیعمەتە زۆرە لەژمارە نەهاتووەکانی - کە لە نێوان ئەو دوو کاتەدا بەخشیونی - زیاتر دەربڕن. جا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم واتا و ناوەڕۆکە قووڵ و وردە، پێم باشە کە هاودەم لەگەڵ دەروونی مندا گوێ بۆ پێنج سەرنج ڕابگریت:

❑ **سەرنجی یەکەم:**

نوێژ - لە ناوەڕۆکی‌دا - بریتی‌یە لە تەسبیحات و بە گەورە ڕاگرتن و ستایش نواندن بەرامبەر بە خوای گەورە. واتە:

پیرۆز ڕاگرتنی خوای گەورە، بە کردار و گوفتار، بەرامبەر گەورەیی و شکۆمەندی(جلال)ی ئەو، بە وتنی: "سبحان الله"..

هەروەها ڕێز لێگرتنی، بە ڕەفتار و کردار، بەرامبەر کەماڵ(کمال)ی ئەو، بە وتنی: "الله أكبر"..

هەروەها ستایش کردنی بە کردەوە و دڵ و زمان و لەش بەرامبەر جوانی(جمال)ی ئەو، بە وتنی: "الحمد لله".

واتە ئەم سیانە: "سبحان الله، ألله أکبر، الحمد لله" بریتین لە بنج و بناوان و تۆوی نوێژ، بۆیە لە هەموو زیکر و هەڵسان و دانیشتنێکی نوێژدا هەن. هەر لەبەر هەمان هۆیە و بۆ چەسپاندنی ناوەرۆکی نوێژ و بۆ مەبەستی جێگربوونیەتی لە دڵدا کە لە دوای نوێژەکانیش هەر یەکی سی و سێ جار دووپات دەبنەوە. چونکە بەم وشە کورت و پڕ واتایانە واتا و کاکڵە و ناوەرۆکی نوێژ دەچەسپێت و لە دڵدا جێگیر دەبێت.

❑ **سەرنجی دووهەم:**

پەرستش – لە ناوەرۆکدا – بریتی‌یە لەوەی کە بەندە بە خۆشەویستی‌یەکی پاکی بێ گەرد و بەوپەڕی ڕێز و سەرسوورمانەوە سوژدە بەرێتە بەر دەرگانەی خوایەتیی خوا و، سەر بخاتە سەر زەوی لە بەردەم کەماڵی پەروەردگاریێتی و دەستەڵاتی نەبڕاوە و میهرەبانیی خوایەتیی ئەودا و، لە هەمان کاتدا "بێ دەستەڵاتی" و "هەژاری" و "لاوازی"ی خۆیشی ببینێت.

بەڵێ، هەروەك "پەروەردگاریێتی"ی خوای گەورە خوازیاری بەندایەتی و گوێڕایەڵی‌یە، پیرۆزی و بێ نیازیی ئەو پەروەردگاریێتی‌یەش داخوازی ئەوەن کە "بەندە" – لەگەڵ داوای لێبوردن و بینینی کەموکووڕی‌یەکانی – دەری ببڕێت کە: خواوەند پاك و بێ نیازە لە هەموو کەموکووڕی‌یەك و، ڕایبگەیەنێت کە ئەستۆی سەرجەمی بیروڕا پووچەڵەکانی گومڕایان ناتوانێت بگاتە گەورەیی ئەو خوایە و، خواوەند بەرز و بڵندە بەسەر هەموویاندا. هەروەها دەری ببڕێت کە خوای گەورە هێندە خاوێن و بڵندە کە دەستی هیچ چەشنە کەموکووڕی و ناتەواوی‌یەکی بوونەوەران ناگاتە داوێنی بەرز و بڵندی‌یەکەی..

بەڵێ، هەموو ئەمانە بە وتنی: "سبحان الله" دەربببڕێت..

هەروەها کەماڵی توانستی پەروەردگاریێتی داوا لە "بەندە" دەکات کە پەنا بباتە بەری و پشتی پێ ببەستێت. چونکە بەندە "لاوازی"ی خۆی و "بێ دەستەڵاتی"ی سەرجەمی بەدیهاتووان دەبینێت. ئیتر لە بەرامبەر مەزنیی ئاسەوارەکانی توانستی صەمەدانی‌یەوە و بە دەربڕینی ئەوپەڕی ڕێز و سەرسوورمانەوە: "ألله أکبر" دەکات و بە کەماڵی خشووع و ئەدەب و ملکەچی‌یەوە دەڕواتە ناو "ڕکووع"ەوە..

هەروەها میهرەبانیی فراوان و نەبڕاوەی پەروەردگاریێتیی خوای گەورە داوا لە "بەندە" دەکات کە بە زمانی نزا و پاڕانەوە، پێداویستی‌یەکانی خۆی و گشت بوونەوەران و، "هەژاری" و "بێ دەسەڵاتی"ی هەموویان، لە دەرگای ئەو گەنجینە نەبڕاوەیەی میهرەبانیی پەروەردگاردا بخاتە ڕوو. هەروەها بە وتنی: "الحمد لله" شوکرانە و سوپاسگوزاریی ئەو

نیعمەتە زۆر و چاکەکاری و میهرەبانی‌یە زەبەندەیەش دەربڕێت کە ئەو پەروەردگارە میهرەبانە ڕشتوونی بە سەریاندا. واتە: کردار و گوفتارەکانی نوێژ، ئەم واتایانەیان تێدایە و، هەر لەبەر دەرخستنی ئەم ناوەرۆکانەیە کە خوای گەورە نوێژی لە سەرمان فەرز کردووە.

❑ **سەرنجی سێهەم:**

هەروەك مرۆڤ نموونەیەکی پوخت و بچووکی ئەم بوونەوەرانەیە و، سورەتی "فاتحە"ش نموونەیەکی نوورانیی قورئانی پیرۆزە، بە هەمان جۆر "نوێژ"یش پێرستێکی نوورانی‌یە کە هەموو پەرستشەکان لەخۆ دەگرێت و نەخشەیەکە ڕێ و شوێنی پەرستشەکانی سەرجەمی بەدیهاتووانی لەسەر دانراوە و ئاماژەی تێدا بۆ کراوە.

❑ **سەرنجی چوارەم:**

هەروەك بە جوولانی هەریەکە لە چرکە ژمێر و خولەك ژمێر و کات ژمێر و ڕۆژ ژمێری هەر سەعاتێك ئەوی تر دەجوولێت و حوکمی ئەوی تر وەردەگرێت، جیهانی دنیاش - کە بریتی‌یە لە سەعاتێکی گەورەی خوایی - بە هەمان جۆرە، چونکە خولی شەو و ڕۆژ کە وەك چرکە ژمێرە و، هی ساڵەکان کە وەك خولەك ژمێر وان و، ئاڵوگۆڕی چینەکانی تەمەنی مرۆڤ کە کات دەژمێرن و، چەرخ وسەردەمەکانی تەمەنی جیهان کە ڕۆژ ژمێری جیهانن، هەریەکەیان ڕووی لەوانی ترە و لەوان دەچێت و حوکمی ئەوانی تر وەردەگرێت و یەکتر یاد دەخەنەوە.

بۆ نموونە:

کاتی (**بەیانی تا گزنگ**): سەرەتای بەهارمان یاد دەخاتەوە و لەو کاتە دەچێ.. هەروەها ئەو کاتە دەخاتەوە یاد کە مرۆڤ کەوتووەتە ناو ڕەحمی دایکیەوە.. هەروەك یەکەم ڕۆژی شەش ڕۆژەکەی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەویمان دەخاتەوە یاد و لەو ڕۆژە دەچێ..

بەم جۆرە، "کات"ی ئەم نوێژە مرۆڤ بۆ ئەو کارە گەورە خوایی‌یانە ئاگادار دەکاتەوە کە لەم کاتانەدا بەڕێ دەکرێن.

کاتی (**نیوەڕۆ**)یش: ئاماژە بۆ ناوەڕاستی هاوین و، هەرەتی لاوی و، دەمی بەدیهێنانی مرۆڤ لە تەمەنی دنیادا دەکات و، دەرکەوتن و درەوشانەوەی میهرەبانیی خوا و ڕێژنە و لێشاوی نیعمەتەکانیمان لەو کاتانەدا یاد دەخاتەوە.

کاتی (**عەسر**)یش: وەکو وەرزی پایز و، ماوەی پیری و، چەرخی بەختەوەری وایە کە سەردەمی دواهەمین پێغەمبەرە ﷺ. ئەمەش کاروبار و نیعمەتە سەرتاپا میهرەبانی‌یەکانی خوامان یاد دەخاتەوە.

کاتی (**خۆرئاوا و شێوان**)یش: ئاوابوونی زۆربەی بوونەوەران لە کۆتایی پایزدا و، مردنـی مرۆڤ و، کاول بوونی دنیامان لە دەمی بەرپابوونی قیامەتدا دەخاتەوە یاد.. لەگـەڵ ئەمەشـدا دەرسی شکۆمەندیی خوامان پێ دەڵێت و، مرۆڤ لە خەوی بێ ئاگایی ڕادەپەڕێنێت.

کاتی (**عیشا**)یش: ئـەوەمان پیشـان دەدات کـە "جیـهانی تـاریکی" پـەردەی ڕەشـی بەسـەر ڕوخسـاری "جیـهانی ڕوونـاکی"ی ڕۆژدا دادایـەوە. هـەروەها کفنـە سـپی‌یەکەی زسـتانمان دەخاتـەوە یـاد کـە سـەر ڕووی زەوی دادەپۆشـێت. تەناتـەت ئـەوەشمان یـاد دەخاتـەوە کـە شـوێنەواری مردووەکـانیش دەمرێـت و دەڕواتـە ژێـر پـەردەی لەیادچوونـەوە. هـەروەها ئـەو کاتەمان یاد دەخاتەوە کە دەرگاکانی خانـەی تاقیکردنـەوەی دنیـا بـە تـەواوی دادەخرێـن. لـە هـەموو ئەمانەشـدا ـ ئـەم کاتـە ـ کـرداره شـکۆدارەکانی خـوای "قەهـهاری شـکۆمەند" دەردەخات و ڕایاندەگەیەنێت.

کاتی (**شەو**)یش: زستان و قەبر و جیهانی بەرزەخمان یاد دەخاتەوە. سەرەڕای ئەوەی کە "گیان"ی مرۆڤیش ئاگادار دەکاتەوە بۆ ئەوەی کە چەندە پێویستیی بە سۆز و میهری خوای گەورەی میهرەبانە!

(**شەونوێژ**)یـش: فێرمـان دەکـات کـە چـەندە بـۆ ڕۆشـنایی تاریکـە شـەوی قـەبر و ڕوونـاك کردنەوەی تاریکایی جیهانی بەرزەخ پێویستیمان پێیـەتی. هـەروەها ئاگادارمـان دەکاتـەوە و یـادی ئـەو نیعمەتـە بێ کۆتایی‌یانـەی نیعمـەت بەخشـی ڕاستەقینەمان پێ دەکاتـەوە کـە لـەم ئاڵوگۆڕانەدا هەن و، ئەوە دەردەخات کە چەندە ئەو نیعمەت بەخشـە ڕاستەقینەیە شایستەی شوکر و سەنا و ستایشە.

(**بەیانیی دووهەم**)یش: بەرەبەیانی "حەشر"مان یاد دەخاتەوە! بەڵێ، هەروەك هاتنی بەیانی بە دوای ئەم شەوەدا و، بـەهار بـە دوای ئـەم زستانەدا شتێکی پێویسـت و "حـەتمی"یـە بـە لای ژیری‌یەوە، بە هەمان پلە و پایە، هاتنی بەرەبەیانی "حەشر" و بـەهاری "بـەرزەخ"یـش حـەتمی و دوور لە گومانە.

کەواتـە، هەریەکـە لـەم پێنـج کاتانـە سـەرەتای ئـاڵوگۆڕێکی گرنگـە و گۆڕانکـاریی گەورەتریشمان یاد دەخاتەوە. چونکـە موعجیزاتی توانستی خـوای گـەورە و دیاری‌یـەکانی میهرەبانیی ئەومان دەخاتـەوە یـاد کـە لـە سـاڵ و چـەرخ و سـەردەمەکاندا ڕوو دەدەن، ئـەوەتا کاروبارە ڕۆژانەکەی خوای گەورەی بەتوانا ئاماژەیان بۆ دەکەن.

واتە نوێژی فەرز ـ کە فەرمانبەریی فیترەت و بناغەی بەندایـەتی و قـەرزی ئەستۆیە ـ زۆر شایان و بەجێ‌یە کە لەم کاتانەدا بێت.

❑ **سه‌رنجی پێنجه‌م:**

مرۆڤ – له‌ سروشتی‌دا – تابلێی لاوازه‌، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئه‌و شتانه‌ی كه‌ ژیانی لێ تاڵ و لێڵ ده‌كه‌ن و خه‌فه‌ت و ئازاری بۆ دروست ده‌كه‌ن، گه‌لێ زۆرن..

له‌ هه‌مان كاتدا تابلێی ده‌سته‌وسان و بێ ده‌سته‌ڵاته‌، كه‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا گه‌لێ دوژمن و به‌ڵا و گیروگرفتی له‌سه‌ر رێگایدایه‌..

هه‌روه‌ها گه‌لێ هه‌ژاره‌، كه‌چی پێویستی‌یه‌كانی ژیانی یه‌كجار گه‌وره‌ و زۆرن..

هه‌روه‌ها ته‌مبه‌ڵ و بێ توانایه‌، كه‌چی ده‌بینیت كاروباری ژیان گه‌لێ قورسن له‌سه‌ر شانی..

مرۆڤایه‌تی‌یه‌كه‌ی وای لێ كردووه‌ كه‌ په‌یوه‌ندیی له‌گه‌ڵ سه‌رجه‌می بوونه‌وه‌ردا هه‌بێ به‌ گشتی، كه‌چی جودایی خۆشه‌ویستان و له‌ناوچوونی ئه‌و شتانه‌ی مایه‌ی ته‌سكینیی دڵن، ئازاری ده‌ده‌ن..

هه‌روه‌ها عه‌قڵ و هۆشی مرۆڤ ئامانجی به‌رز و به‌روبوومی نه‌بڕاوه‌ی پیشان ده‌ده‌ن، كه‌چی ده‌ستی به‌و ئامانج و به‌روبوومانه‌ ناگات و، ته‌مه‌نی كورته‌ و، كه‌م ده‌سته‌ڵاته‌ و، توانای ئارامگرتنیشی یه‌كجار كه‌مه‌.

له‌به‌ر هه‌موو ئه‌مانه‌ و له‌ حاڵه‌تێكی وه‌هادا، سه‌یر بكه‌ و بزانه‌ كه‌ "گیان"ی مرۆڤ چه‌نده‌ پێویستی به‌وه‌ هه‌یه‌ له‌:

"**به‌ره‌به‌یان**"دا به‌ دوعا و نوێژ و پاڕانه‌وه‌ له‌ ده‌رگانه‌ی خوای به‌ده‌سته‌ڵاتی شكۆمه‌ند و میهره‌بان و خاوه‌نی جوانی بدات و، به‌ داوای یارمه‌تی دانه‌وه‌ عه‌رزوحاڵی خۆی پێشكه‌ش بكات؟! گیانی مرۆڤ چه‌نده‌ پێویستی به‌ پاڵپشتێكه‌ پاڵی پێوه‌ بدات و هه‌موو كاروبارێكی قورسی ڕۆژ – كه‌ له‌ ڕێگایدایه‌ – به‌هۆیه‌وه‌ هه‌ڵبگرێت و به‌ره‌نگاری ببێت؟ ئایا ئه‌مه‌ شتێكی ئاشكرا نی‌یه‌؟

له‌كاتی "**نیوه‌ڕۆ**"شدا: كه‌ لوتكه‌ی كه‌مالی ڕۆژ و خوار بوونه‌وه‌یه‌تی به‌ره‌و نه‌مان و، كاتی كامڵ بوونی كاروباری ڕۆژانه‌ و، وه‌ختی حه‌سانه‌وه‌ی دوای ماندوو بوونی كار و، ده‌می هه‌ناسه‌ و پشوودانی "گیان" و حه‌وانه‌وه‌یه‌تی له‌و بێئاگایی و سه‌رسامی و په‌شۆكان و نارێكیی ده‌روونه‌ی كه‌ دنیای فانی و كاروباره‌ قورسه‌كانی ده‌رخواردی مرۆڤی ده‌ده‌ن..

جگه‌ له‌وه‌ی كه‌ ئه‌م كاته‌ كاتی خۆ ده‌رخستن و نواندنی نیعمه‌ته‌كانی خوای گه‌وره‌شه‌..

جا ڕزگاربوونی "گیان"ی مرۆڤ له‌و هه‌موو ئازارانه‌ و خۆ قورتار كردنی له‌و بێ ئاگایی و سه‌رسامی‌یه‌ و، ده‌رباز بوونی له‌و شته‌ كه‌م نرخانه‌، ته‌نها به‌وه‌ ده‌بێ كه‌ مرۆڤ به‌ سكاڵا و پاڕانه‌وه‌ هانا به‌رێته‌ به‌ر ده‌رگانه‌ی ڕۆزیده‌ری ڕاسته‌قینه‌ و.. به‌ شوكر و شتایش

دەبێ لە بەرامبەر ئەو نیعمەتە زۆرانەی کە لای کۆ بوونەتەوە.. هەروەها بەوە دەبێ کە تەنها پشت بەو خواوەندە ببەستێ و داوای یارمەتی تەنها لەو بکات، هاودەم لەگەڵ دەربڕینی بێ دەستەڵاتیی خۆی لە بەرامبەر گەورەیی و شکۆمەندیی خوای گەورەدا بە "ڕکووع بردن" و، دەربڕینی ملکەچیی خۆی، بەوپەڕی ئەدەب و ڕێز و خۆشەویستییەوە، بە "سوژدە بردن" بۆ کەماڵی هەمیشەیی و جوانیی بێ وێنە و ناوازەی ئەو.

ئەمەیە نوێژی نیوەڕۆ! کەواتە چەندە جوان و بەتام و شیاو و پێویستە؟

دەبا ئیتر هیچ کەسێ خۆی بە مرۆڤ نەداتە قەڵەم گەر لەمە تێ نەگات!

لە دەمی **"عەسر"**یشدا: کە کاتێکە وەرزە خەفەتبارەکەی پایز و، دەمی خەم بزوێنی پیری و، ڕۆژانی پڕ لە ئازاری ئاخر زەمان و، کاتی دەرکەوتنی بەرهەمی کردەوەی ڕۆژانەمان دەخاتەوە یاد و.. دەمی کۆبوونەوەی تێکڕای نیعمەتە مەزنە خواییەکانە، وەك: چەشتنی تەندروستی و لەشساغی و ئەنجامدانی خزمەتگوزاریی ڕێك و پەسەند.. هەروەها کاتی ڕاگەیاندنی ئەوەیە کە مرۆڤ میوانێکی ڕاسپێرراوە و، هەموو شتێکیش لە جموجووڵدایە و بەرەو نەمان دەڕوات. ئەوەتا خوار بوونەوەی ئەو خۆرە گەورەیەی ئاسمان بەرەو ئاوا بوون، ئاماژە بۆ ئەم مەبەستە دەکات.

بەڵێ "گیان"ی مرۆڤ کە داواکاری نەمری و هەمیشەییە و لە ڕاستیشدا بۆ مانەوە و هەمیشەیی بەدی هێنراوە و، شەیدای جوانی و چاکەکارییە و، جوداییش ئازاری دەدات.. ئەم مرۆڤە، لە دەمی عەسردا دەستنوێژ دەگرێت و نوێژی عەسر بەجێ دەهێنێت، تاکو لە دەرگانەی خواوەندی "قدیم" و "باقی"دا بپاڕێتەوە، ئەو خوایەی کە مانەوە و ڕاگیربوونی هەموو شتێك بە دەستی ئەوە. هەروەها بۆ ئەوەی پەنا بباتە بەر گەورەیی و هەمیشەیی میهرەبانییە فراوانەکەی و، شوکر و ستایشی نیعمەتە لە ژمارە نەهاتووەکانی پێشکەش بکات. دەبینیت بەوپەڕی ملکەچییەوە "ڕکووع" دەباتە بەردەم عیززەتی پەروەردگارێتیی خوا و، بەوپەڕی لەخۆبوردن و خۆنەویستیشەوە "سوژدە" دەباتە بەردەم هەمیشەیی خوایەتیی ئەو. ئنجا ئاسوودەیی دەروون و پشوودانی ڕاستەقینەی "گیان"یشی لەوەدا دەبینێتەوە کە بە بەندایەتییەکی ڕێك و پێك و بە ئامادەییەکی تەواو لە بەرامبەر خوایەتیی خوای گەورەدا ڕابووەستێت.

ئیتر وەرە سەیر بکە و بزانە کە: بەجێهێنانی نوێژی عەسر – بەم واتا و ناوەرۆکە – چەندە خزمەتگوزارییەکی شایستە و فەرمانبەرییەکی بەرزە؟ بەڵکو چ وەختێکی شایستە و گونجاوە بۆ گێڕانەوەی قەرزی "فیترەت" کە لە ئەستۆماندایە و، چەندە دەستکەوتێکی بەتامی لەزەت بەخشە بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری!

هەر كەسێك بە ڕاستی مرۆڤ بێت، لەمە تێدەگات!

لە كاتی "**مەغریب**"یشدا: كە چەند شتێكی گرنگمان یاد دەخاتەوە، وەك: ئـاوابوونی ئـەو بەدیهاتووە ناسكۆڵە و جوانانەی جیهانی هاوین و پایز، لە گەنجینەی ئەمانەتەكان لە سەرەتای وەرزی زستاندا..

هەروەها وەك: یادخستنەوەی ڕۆشتنی مرۆڤ بۆ ناو گـۆڕ لـە كـاتی مردنـدا و، جودایی و لێكدابڕانی بەسۆ و ئازاری لە گشت خۆشەویستانی..

هەروەها وەك: یادخستنەوەی مردنی دنیا بە گشتی و گواستنەوەی دانیشـتووانی بـۆ چـەند جیهانێكی تر..

هەروەها وەك: یادخستنەوەی كوژانەوەی چرای تاقیگەی ئەم دنیایە..

"كاتی مەغریب" وەختی ئاگادار كردنەوە و ڕاپەڕاندنی گشت ئەو كەسانەیە كە تا ڕادەی پەرستن، شەیدای ئەو شتانەن كە لە پشت ئاسۆی "نەمان"ەوە ئاوا دەبن!

جا لەبەر هـەموو ئەمانـە، ئـەو مرۆڤـەی كـە خـاوەنی "گیـان"ێكـی پـاكی بـێ گـەردی وەك ئاوێنەیـە و، بـە سروشـت تاسـەمەندە بـۆ موتـالآ كردنـی درەوشـانەوەی جوانیـی خـواوەنـدی هەمیشەیی و باقی.. ئەم مرۆڤە، بۆ بەجێهێنانی نوێژی شێوان لەم كاتەدا، ڕوو دەكاتـە عەرشـی گەورەیی ئـەو خوایـەی كـە هـەر بـووە و هـەر دەشبێ، ئـەو خوایـەی كـە هـەرچی كاروبـاری گـەورە و ئـاڵوگۆڕی ئـەم جیهانـە مەزنـە هەیـە هـەر تەنـها ئـەو سـازیان دەكـات و هـەڵیان دەسووڕێنێت.

بۆیـە بـە دەنگێكـی زوڵاڵ هـەموو دەوروبـەری خـۆی دەلەرێنێتـەوە و لـە ڕووی گشـت بوونەوەرە فـانیيەكانـدا "ألله أكبر" دەڵێت و دەسـتی لە هـەموویان دادەتـەكێنێت. ئنجـا لـە بەردەم كەماڵی بەرز و جوانیی بێ وێنەی خوای گەورەدا دەستەونەزەر ڕادەوەستێت، تاكو بە وتنی: ﴿ **الحمدُ لله** ﴾ ستایشی میهرەبانیی نەبڕاوەی ئەو بكات و، پاشان بە وتنی: ﴿ **إيّاكَ نَعْبُدُ وإيّاكَ نَسْـتَعِين**﴾یش بەندایـەتی و پشـت بەخوابەسـتنی خـۆی بخاتـە بـەردەم پـەروەردگارێتی و خوایەتیی ئەو خوایەی كە پێویستی بە یاریدەدەر و هاوەڵ و وەزیـر نیـیە و نیشیەتی. ئیـتر ئـەو مرۆڤە، هاودەم لەگەڵ سـەرجەمی بوونەوەراندا، دەچێتە "ڕكووع"ەوە و، بە وتنی: "سـبحان ربـي العظیم وبحمده" بێ دەسـتەلآتی و لاوازی و هـەژاریی خـۆی لە بـەرامبەر گـەورەیی هەمیشەیی و دەستەلآتی نەبڕاوە و عیززەتی بێ كەموكووڕیی خواوە، دەردەبڕێت.

پاشان كڕنووش دەباتە بەردەم جوانیی زاتی ئەو خوایـەی كـە نـەمانی نیـیە و، ئـەو سیفەتە پیرۆزانـەی كـە گـۆڕان ڕوویـان تـێ نـاكـات و، ئـەو كەماڵـە هەمیشـەییيەش كـە هـەرگیز ناگۆڕێت. بەمەش واز لە پەرستنی غەیری خوا دەهێنێت و خۆشـەویستی و بەندایەتیی خۆی

- بەوپەڕی ڕێز و خۆنەویستی و سەرکزی‌یەوە - بە وتنی: "سبحان ربي الأعلى" دەردەبڕێت، چونکە لە بڕیی هەموو شتێکی فانی و بڕاوە، جوانێکی هەمیشەیی و خاوەن میهرەبانی‌یەکی بەردەوامی دۆزیوەتەوە. بەمەش خۆشەویستی و بەندایەتی و ڕێزلێنانی لە خوای خۆی بەوپەڕی توانەوە و خۆنەویستی‌یەوە ڕادەگەیەنێت، ئەو خوایەی کە بەرزە بەسەر هەموو نەمانێکدا و پاکە لە هەموو کەموکووڕی‌یەك.

پاشان بۆ "تشهّد" و خوێندنی "تەحیات" دادەنیشێت و، لەو ڕێگایەوە سڵاوی پیرۆز و سڵاواتی پاك و بێگەردی هەموو بوونەوەران پێشکەش دەکات بە بارەگای ئەو خوا خاوەن جوانی‌یەی کە بووە و، ئەو خاوەن گەورەیی‌یەی کە هەر هەیە.. هەروەها پەیمان لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویستدا ﷺ تازە دەکاتەوە بە سڵاو لێ کردن و دەربڕینی گوێ ڕایەڵیی فەرمانەکانی..

لەم کاتەدا ڕێك و پێکیی بە دانست نەخشاوی ئەم کۆشکەی گەردوون دەبینێت و دەیکات بە شایەت لەسەر "یەکتایی" بەدیهێنەری شکۆمەند و، بەمەش ئیمانی خۆی نوێ دەکاتەوە..

پاشان شایەتمان بە شانی ڕاگەیەنەر و پێناسەری پەروەردگاریتیی خوای گەورە و ڕوونکەرەوەی ئایەتەکانی کتێبی گەردوون دەهێنێت کە حەزرەتی محەممەد پێغەمبەرە ﷺ.

ئنجا بڕوانە بۆ بەجێهێنانی نوێژی مەغریب بەم ناوەرۆکە بەرزە و، بزانە کە چەندە فەرمانبەری‌یەکی بڵند و پاك و بێ گەرد و شیرینە و، چەندەش بەندایەتی‌یەکی بەتام و جوانە و، چ ڕاستی‌یەکی ڕەسەن و مەزن و بەرز و باڵایە!

دەبینین ئەنجامدانی نوێژی مەغریب - بەم شێوە و واتایە - هاودەمی‌یەکی بەوەفایانەیە و دانیشتنێکی پیرۆز و نەبڕاوەیە لە میوانی‌یەکی بڕاوەی وەك ئەم دنیایەدا.

ئایا ئەو کەسەی لەمە تێ نەگات، خۆی بە مرۆڤ دەزانێت؟

دەمی "**عیشا**"یش، کە هیچ شوێنەوارێکی ڕۆژی تێدا نامێنێت و هەموویان لە ئاسۆدا ئاوا دەبن و "شەو"یش بە ڕەشماڵی خۆی جیهان دادەپۆشێ.. ئەم کاتە، چەند شتێکمان یاد دەخاتەوە، وەك: کاروبارە پەروەردگاری‌یەکانی ئەو خوایەی "مُقلِّبُ الليلِ والنهار"ە، کە خوای بەتوانای شکۆمەندە و، خوایەکە لاپەڕە سپی‌یەکەی "ڕۆژ" دەگۆڕێت بە لاپەڕە ڕەش داگیرساوەکەی "شەو"..

هەروەها وەك: یادخستنەوەی کار بەڕێ کردنە خوایی‌یەکانی ئەو کەسەی "مُسخِّرُ الشّمسِ والقمر"ە، کە خوای دانای خاوەن کەماڵە و، خوایەکە لاپەڕە ڕەنگینەکەی هاوین دەگۆڕێت بە لاپەڕە سارد و سپی‌یەکەی زستان..

هەروەها وەك: یادخستنەوەی كاروبارە پەروەردگاریـیەكانی ئەو خوایەی كە "خـالِقُ الموت والحیاة"ە، ئەویش بە بنەبڕ بوونی هەموو شوێنەوارێكی خەڵكی گۆڕستان - بە درێژایی ڕۆژگار - لەم دنیایەدا و گواستنەوەیان بە گشتی بۆ جیهانێكی تر.

بەڵێ، كـاتی عیشـا كاتێكـە كاروبارەكـانی "شـكۆمەندیی" خـوای گـەورە و، درەوشـانەوەكانی "جوانـی"ی بەدیهێنـەری ئاسـمانەكان و زەوی و، دەركـەوتنی جیـهانی فراوان و مەزن و نەبڕاوەی دواڕۆژ و، مردن وكاول بوونـی یەكجارەكیی دنیـای تـەنگ و تەسكی كەم نرخی فانیمان دەخاتەوە یاد..

كاتی عیشـا، كـات و هەلوێستێكە دەیسەلمێنێت كە: خـاوەن و بەڕێوەبەری ڕاستەقینە و شایستەی پەرستنی ڕاستەقینە وخۆشەویستی ڕاستەقینە تەنـها ئەو كەسەیە كە ئاڵ و گۆڕی "شەو" و "ڕۆژ" و، "زستان" و "هاوین" و، "دنیا" و "قیامەت"ی وەك ئاسانیی هەڵگێڕانەوەی لاپەڕەی كتێب بەلاوە ئاسانە.. ئەو كەسەیە كە نووسین وكوژاندنـەوە و گۆڕینـی لاپـەڕەكانی كتێبی بوونـەوەری بـە دەسـت بێـت. دیـارە ئەمـەش لـە دەسـت هیـچ كەسێك نایـەت مەگـەر خاوەنی ڕەهاترین دەستەڵات كە فەرمانەكانی هەمیشە جێبەجێ كراوە.

"گیان"ی مرۆڤیش كە لەوپەڕی هـەژاری و كۆلـەواری و دەستەوسـانیدایە و، خـەمناك و سەر لـێ شێواوی دواڕۆژە و، نازانێ چی لە ژێر پەردەی شارراوەی ئەو شەو و ڕۆژانەدایە كە لەسەر ڕێی ژیانیدان.. ئەم مرۆڤە، كە نوێژی عیشا دەكات - بەم ناوەرۆك و شێوەیەی باسمـان كرد - بە بێ هیچ دوودڵیـیەك و بـە وێنـەی سـەروەرمان ئیـبراهیم پێغەمبـەر - دروودی خـوای لەسەر بێت - دەڵێت:

﴿ لا أحبُّ الآفِلين ﴾ (الأنعام:٧٦)!

بۆیە دەبینیت بە نوێژ كردن پەنا دەباتە بـەر دەرگانـەی پەرستراوی ئـەزەلی و خۆشەویستی هەتاهەتایی و، لەم دنیا و جیهانە فانییەدا ڕاز و سكاڵای خۆی لە خزمـەت خـواوەنـدی بـاقیی هەمیشەییدا دەدركێنێت لە دەست ئـەم دنیـا تاریكـە و ئـەو دواڕۆژەش كە هیچـی لـە بـارەوە نازانێت، تاكو لە ڕێی ئەم نزیكییە سەرپێیی و ڕاز دركاندن و پاڕانەوە كاتییەوە، ڕوونـاكی بـە ژیـانی ئـەم دنیـای ببەخشێت و، بـە بینینـی ڕوو تێكـردن و ئـاوڕ لێدانــەوەی میهــرەبانیی خـواوەندی "بەخشندە" و "میهرەبان" دواڕۆژیشـی ڕوونـاك بكاتەوە و تیماری ئەو زامانەشـی پێ بكـات كـە جودایـی و لێكدابڕانـی كـەس و كـار و هـاوڕێ و خۆشەویسـتان لـە دەروونـدا دروستیان دەكات..

ئیتر ئەو دنیایەی كە ئەمی لە یاد كردووە ئەمیش لە یـادی دەكـات و، فرمێسـكەكانی دڵ و خەم وپەژارەكانی دەروونی خۆی لە بەردەم ئەو میهرەبانییە نەبڕاوەیەدا هەڵدەڕێژێت.

جا بۆ ئەوەی دواهەمین فەرمانبەریی بەندایەتی (واتە نوێژی عیشا) بەجێ بهێنێت، پێش ئەوەی بڕواتە ناو شتێکەوە کە ئەنجامی نادیارە و نازانێت پاش ئەو نوستنەی کە لە مردن دەچێت، چیی بەسەر دێت..

هەروەها بۆ ئەوەی دەفتەری کردەوەی ڕۆژانەی بە "حُسْنُ الخاتمة" کۆتایی پێ بهێنێت..

لەبەر هەموو ئەمانە، لەم کاتەدا نوێژی عیشا بەجێ دەهێنێت و شەرەفمەند دەبێت بە ڕاوەستانی لە بەردەم خۆشەویست و پەرستراوی ڕاستەقینە و هەمیشەییدا، لە بریی پەرستنی هەر خۆشەویستێکی تر و.. لە بەردەم خواوەندی بەخشندەی بەتوانادا ڕادەوەستێت، لە بریی ڕاوەستانی لە دەرگای ئەو بێ دەستەڵاتانەی کە خۆیشیان دەستیان کورتە و دەست لە غەیری خۆیان دەگرنەوە.. هەروەها بۆ ئەوەی بە ڕاوەستانی لە دەرگانەی خواوەندی پارێزەری میهرەباندا، پلەی ئیمانەکەی بەرز ببێتەوە و لە شەڕی ئەو شتە سامناکانە دەرباز ببێت کە لێیان دەترسێت..

بە تایبەتی کە سەرەتای نوێژەکەی بە "فاتحە" دادەمەزرێنێت! واتە لە سەرەتاوە مەدح و ستایشی پەروەردگاری جیهانیان و بەخشندەی میهرەبان دەکات. ئەو خوایەی کە خاوەنی کەماڵێکی بێ سنوور و دەوڵەمەندییەکی نەبڕاوەیە. ئیتر چ کارێکی بەسەر مەدح و ستایشی ئەو بەدیهاتووانەوە هەیە کە هیچ سوودێکیان نییە و شایانی ستایش نین، تەنانەت لاواز و هەژاریشن؟ هەروەها لە بریی هەڵگرتنی "منەت"، بۆ پلەی "میوانی نازداری ناو ئەم گەردوونە" و "فەرمانبەری ناسراو" بەرز دەبێتەوە، هەرچەندیش بچووك و نادیار بێت، تەنانەت وەك "نەبوو" وابێت لەچاو گەورەیی بوونەوەردا. ئەمەیش بەهۆی بەرزبوونەوە و گەیشتنە پلەی وتوویژی: ﴿**إِيَّاكَ نَعْبُدُ**﴾. واتە بە نیسبەت پەیدا کردنی لەگەڵ خاوەنی ڕۆژی قیامەت ﴿**مالِكِ يَوْمِ الدِّين**﴾ و پادشای ئەزەل و ئەبەددا. کەواتە بە وتنی: ﴿**إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نستعين**﴾ پەرستش و داواکاریی یارمەتی دانی کۆمەڵگای گەورەی هەموو بوونەوەران پێشکەش دەکات و، پاشان بە ناوی هەموانەوە و بە وتنی: ﴿**إهْدِنا الصِّراطَ الْمُسْتَقيم**﴾ داوای ڕێنمایی ڕێی ڕاست دەکات، کە شارێگایەکی نوورانییە و مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەو بەختەوەرییە هەمیشەیییەی کە دوای تێپەڕ کردنی تاریکاییەکانی دوارۆژ پێی دەگات.

پاشان بیر لە گەورەیی خوا دەکاتەوە و سەرنج لەو خۆرە شارراوانە دەدات، کە وەك ڕووەك و ئاژەڵە نوستووەکانی ئێستا وان و، لەم ئەستێرە بێدار و دیارانەش کە هەریەکەیان سەربازێکی گوێ ڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە و چرایەکی ڕووناکی بەخشی ئەم میوانخانەیە و خزمەتگوزارێکی ئەون.. ئیتر کە سەرنج دەدات و ئەمە دەبینێت، یەکسەر لەگەڵ وتنی: "ألله أكبر"دا دەڕواتە ناو "ڕکووع"ەوە.

پاشان لە سوژدەی مەزنی هەموو بوونەوەران ڕادەمێنێت، چونکە دەبینێت هەموو جۆرەکانی بوونەوەران - لە هەموو ساڵ و سەردەمێکدا - بە وێنەی بوونەوەرە خەو لێ کەوتووەکانی ئەم شەوەن، تەنانەت زەوی خۆیشی و بگرە سەرتاسەری جیهانیش وەك سوپایەکی ڕێکوپێك و سەربازێکی گوێڕایەڵ وایە، هەر کە فەرمانبەریێتیی دنیای بە فەرمانی: ﴿كُنْ فَيَكُونُ﴾ تەواو دەبێت و بەرەو جیهانی شارراوەی "غەیب" دەنێرڕێتەوە، یەکسەر بەوپەڕی ڕێکوپێکی و بە وتنی: "ٱللّٰه أكبر"ەوە سوژدە دەباتە سەر بەرماڵی ئاوا بوون!

پاشان ئەم بوونەوەرانە، هەر خۆیان یان لە وێنەی خۆیاندا، تەنها بە ئاگادار کردنەوەیەك، کە فەرمانی: ﴿كُنْ فَيَكُونُ﴾ە، سەرجەم زیندوو دەکرێنەوە و، ئەوانیش بەوپەڕی هێمنییەوە سەر دەردەهێنن و فەرمانی خواوەندی ڕاستەقینەیان جێبەجێ دەکەن.

هەروەها ئەم مرۆڤە لاوازەش - وەك ئەو بوونەوەرانە - بە وتنی: "ٱللّٰه أكبر" سوژدە دەباتە بەردەم بارەگای "بەخشندە"ی خاوەن کەماڵ و "میهرەبان"ی خاوەنی جوانی و، بە خۆشەویستییەکی پڕ ڕێز و خۆنەویستییەکی "بەقا"بەخش و ملکەچ کردنێکی سەربەرزیدەرەوە دەڵێت: "ٱللّٰه أكبر"!

گومانی تێدا نییە کە ئێستا تێ گەیشتیت لەوەی نوێژی عیشا بەرز بوونەوە و سەرکەوتنێکی وەك "میعراج"ە! جا بڕوانە کە چەندە فەرمانبەرییەکی جوان و، ئەرکێکی شیرین و، خزمەتگوزارییەکی بەرز و، بەندایەتییەکی بەتام و سەربەرزکەر و، ڕاستییەکی ڕەسەنی شیاوە.

واتە هەریەکە لەم پێنج کاتانەی نوێژ، پەنجە بۆ ئاڵو گۆڕێکی گرنگ درێژ دەکات کە لە "زەمان"دا ڕوو دەدات و، نیشانەی بەڕێکردنی کارە مەزنە خواییەکان و نیعمەت بەخشینە هەمەکییەکانیەتی.

بەم پێیە بۆمان دەرکەوت کە: دیاری کردنی ئەم کاتانەی نوێژ - کە قەرزی فیترەتە بە ئەستۆمانەوە - لەوپەڕی داناییدایە.

﴿سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنْتَ العَليمُ الحَكيمُ﴾.

اللهم صل وسلم على من أرسلْتَه معلماً لعبادك، ليعلمَهم كيفيةَ معرفتِك والعبوديةِ لك.. ومعرفاً لكنوزِ أسمائِك.. وترجماناً لآيات كتابِ كائناتِك.. ومرآةً - بعبوديتِه - لجمالِ ربوبيتِك.. وعلى آله وصحبه أجمعين. وارحمنا وارحم المؤمنين والمؤمنات. آمين برحمتك يا أرحم الراحمين.

# وتەی دەهەم

## (باسی حەشر)

**ڕوونکردنەوەیەك:**

**هۆی نموونە هێنانەوەم بە شـێوەی چیرۆك لـەم پەیامانەدا ئەوەیە کە واتاکان لـە مێشك و زەینەکانەوە نزیك بخرێنەوە و.. لـە لایـەکی تریشـەوە دەربکـەوێت کە "ڕاستیەکانی ئیسلام" چـەندە لـەگـەڵ ژیریـی مرۆڤـدا تـەبا و شـیاو و گونجاون و، چـەندەش پتـەو و توندوتـۆڵ و ڕەگ داکوتـاون. واتـە ئامـانج و کاکڵەی چیرۆکەکان ئەو ڕاستیانەن کە لـە ئەنجامدا دەیاندەن بـە دەسـتەوە و بەڵگەکانی دەدرکێنن. کەواتە ئـەم چیرۆکانـە ئەندێشـەیی نـین، بـەڵکو تێکـڕا ڕاستیی گومان لـێ نەکراون.**

بسم الله الرحـــمن الرحيم

**﴿فانظُرْ إلى آثارِ رَحْـــمَتِ اللهِ كيفَ يُحيِ الأَرضَ بعد موتِـــها إنَّ ذلك لمحيِ الموتى وهو على كلِّ شيءٍ قديرٌ﴾** (الروم: ٥٠)

برادەر!

ئەگـەر دەتـەوێت ڕاستیی "حەشر" و هـەندێ کاروبـاری سـەر بـە دواڕۆژت لـە ئاسـتی حاڵیبوونی گشتیی خەڵکیدا بۆ ڕوون ببێتەوە، ئەوا فـەرموو لەگـەڵ مندا گـوێ لـەم کورتـە چیرۆکە ڕابگرە:

لە گەشتێکدا دوو کەس پێکەوە بۆ وڵاتێکی گەلـێ قەشـەنگ و تـابلێی جـوان و ڕەنگینـی وەك بەهەشـت ڕۆشـتن (مەبەسـت لـەم تەشبیهە دنیایـە) کـە گەیشـتنە ئـەوێ، سـەرنجیان دا: خەڵکی ئەو وڵاتە دەرگای دوکـان و خانووەکانیـان بـە کـراوەیی جـێ هێشـتووە و، بایـەخ بـە چاودێری و پاراستنی خانووبەرە و دوکانەکانیان نـادەن و، پـارە و پـوول و سـامانەکانیان بـێ هیچ پاسەوانێك و بە ئاشکرا و لـەبەر چاو و دەستی خەڵکیدا داناوە!

كه ئه‌مه‌یان دی، یه‌كێكیان – به‌ هاندانی ده‌روونی به‌دخـوازی خـۆی – ئه‌مه‌ی به‌ هه‌ل زانی و، په‌لاماری ئه‌و كه‌ره‌سه‌ و شمه‌ك و پاره‌ و سامانانه‌ی ئه‌وێی دا و، تاوێ تالآنی ده‌كردن و تاوێكی تر چیی به‌رده‌ست بكه‌وتایه‌ به‌ دزی ده‌یبردن.. به‌م جۆره‌، هه‌ر چه‌شنه‌ سته‌م و خراپكارییه‌كی پێ كرا و لێی وه‌شایه‌وه‌ درێغیی لێ نه‌كرد و، دانیشتووانی وڵاتیش بایه‌خێكی ئه‌وتۆیان پێ نه‌ده‌دا..

هاورێكه‌ی پێی وت:

– (ئه‌وه‌ چی ده‌كه‌یت؟.. بێ گومان تۆ هه‌ر ئاوا ئه‌م كارانه‌ت به‌سه‌ردا تێناپه‌رێت و له‌ ئه‌نجامدا سزای ئه‌م ره‌فتارانه‌ت ده‌چێژیت و، منیش – له‌گه‌ڵ خـۆتدا – دووچاری چه‌ندین به‌ڵا و گیروگرفت ده‌كه‌یت. ئه‌م سامانانه‌ی ده‌یانبینیت، هی ده‌وڵه‌تن و، دانیشتووانی وڵاتیش به‌ خاوخێزانه‌وه‌ تێكرا بوون به‌ سه‌رباز و كارمه‌ندی ده‌وڵه‌ت و، به‌ پۆشاكی میللی(مدنـي)یه‌وه‌ له‌ كار و فه‌رمانبه‌رییه‌كانیاندا خراونه‌ته‌ كار، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌شه‌ كه‌ بایه‌خێكی ئه‌وتۆیان پێ نه‌دایت. ئنجا ئه‌وه‌ش بزانه‌ كـه‌ یاسا و رێسای ئێره‌ گه‌لێ تونـد و تیژه‌ و، له‌ هه‌موو لایه‌كدا ته‌له‌فۆن و چاودێر و هه‌واڵده‌ر و پیاوانی پادشا بڵاو بوونه‌ته‌وه‌، ده‌سا هه‌ر ئێستا خێرا كه‌ و به‌ په‌له‌ برۆ داوای لێبوردن بكه‌).

به‌ڵام هاورێ گێژ و گه‌لحۆكه‌ی، ئینكاری و سه‌رسه‌ختیی نواند و، وتی:

– (ئه‌م سامانانه‌ی ده‌یانبینیت هه‌رگیز هی ده‌وڵه‌ت نین، به‌ڵكو بێ خاوه‌ن و گشتی و هه‌ره‌مه‌كین و، هه‌موو كه‌سێك ده‌توانێت به‌ ئاره‌زووی خۆی ده‌ستیان بۆ ببات. ئه‌وه‌تا من هیچ شتێك نابینم رێی سوود وه‌رگرتنم له‌م شته‌ جوان و ره‌نگینانه‌ی به‌رده‌مم لێ بگرێت.. ئه‌وه‌ش بزانه‌ كه‌: جگه‌ له‌ شتێ به‌ چاو بی‌بینم من باوه‌رم به‌ هیچیتر نییه‌)! پاشان كه‌وته‌ قسه‌ی پروپووچی ورێنه‌ئاسا و فه‌لسه‌فه‌ لێدانی ئه‌م بۆچوونه‌ی خۆی!

ئا لێره‌دا گفتوگۆكه‌ی نێوانیان پتر په‌ره‌ی سه‌ند و كه‌وته‌ دۆخێكی تونـد و گه‌رمه‌وه‌ و، بابای گێلی گه‌لحۆ له‌ هاوه‌ڵه‌كه‌ی زیاتر هاته‌پێش و، لێی پرسی:

– (ئایا پێم ناڵێیت پادشا كێیه‌؟.. من نایناسم)!

هاورێكه‌ی وه‌ڵامی دایه‌وه‌:

– (تۆ گومانت له‌و راستییه‌دا نییه‌ كه‌: گوندی بێ كوێخا و.. ده‌رزیی بێ وه‌ستا و خاوه‌ن و.. پیتی بێ نووسه‌ر نییه‌ و نابێت. ئه‌ی ئایا چۆن ئه‌وه‌ به‌ خۆت ره‌وا ده‌بینیت كه‌ پێت وابێت ئه‌م وڵاته‌ رێكوپێك و ره‌نگینه‌ بێ پادشا و فه‌رمانره‌وا بێت؟ یان چۆن ئه‌م هه‌موو سه‌روه‌ت و سامانه‌ به‌نرخ و به‌هادارانه‌ بێ خاوه‌ن ده‌بن؟ كه‌ ئه‌وه‌نده‌ زۆر و زه‌به‌نده‌ و به‌رده‌وامن ده‌ڵێی له‌ جیهانی په‌نهانی غه‌یبه‌وه‌ شه‌مه‌نده‌فه‌رێكی پر له‌ ئازووقه‌ و رۆزیی به‌نرخ

دەم بە دەم دێت و بارەکەی لێرەدا ڕۆ دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە و دەڕوات[١]؟ ئایا نابینیت لە هەموو لایەکی ئەم وڵاتەدا ئاگاداری و بەیاننامەکانی پادشا بڵاوکراونەتەوە و، ئاڵاکانی لە هەموو گۆشەیەکدا دەشەکێنەوە و، تەمغە و مۆری تایبەتیی خۆی لەسەر ئەو هەموو کاڵا و سەروەت و سامانانە نەخشێنراوە؟ ئیتر چۆن بە بێ خاوەنیان دادەنێیت؟.. دیارە تۆ شتێك لە زمانی فەرەنگ فێربوویت و توانای خوێندنەوەی ئەم نووسینە ئیسلامییانەت نەماوە و، ناتەوێ لە کەسێکی شارەزاش بپرسیت و داوا بکەیت ئەو نووسینانەت بۆ بخوێنێتەوە! وەرە با من گرنگترینی ئەو فەرمان و بەیاننامانەی پادشات بۆ بخوێنمەوە).

هاوڕێ سەرسەختەکەی گەڕایەوە و وتی:

- (با دان بە بوونی پادشایشدا بنێین.. بەڵام ئایا چ زیانێکی پێ دەگات و چ کەموکووڕی و ناتەواوییەك بە گەنجینەکانیەوە دەردەکەوێت گەر من بۆ خۆم سوودێکی ئاوا کەمیان لێ ببینم؟.. پاشان من لێرەدا هیچ بەندیخانە و تۆڵە و سزایەکی هاوچەشنی نابینم کە تۆ باسیان دەکەیت)!

هاوڕێکەی وەڵامی دایەوە:

- (برام! ئەم وڵاتەی بەرچاومان - لە ڕاستیدا - بریتییە لە:

گۆڕەپانێکی تاقیکردنەوە و..

مەیدانێکی مەشق و مانۆڕ و..

پیشانگایەك بۆ خستنەڕووی سنعەتە نایابەکانی پادشا و..

میوانخانەیەکی تابلێی کاتی و کەم خایەن.

ئایا نابینیت هەموو ڕۆژێ کاروانێك میوان دێنە ناوی و کاروانێکی تر دەڕۆن و کۆچ دەکەن و، هەمیشە لە میوان پڕ دەکرێت و پاشان خاڵی دەکرێتەوە؟

جا ئەم مەیدانە - لە ئەنجامدا - بە تەواوی و یەکجاری لە میوانەکانی ناوی چۆڵ دەکرێت و دەگۆڕیت بە مەیدانێکی تری نوێی هەمیشەیی و، ئنجا هەموو خەڵکی بۆ ئەوێ دەبرێن و، هەریەکەیان "سزا" یان "پاداشت"ی خۆی لەوێ وەردەگرێت).

هاوڕێ خیانەتکار و سەر لێ شێواوەکەی، جارێکی تر لێی هەڵگەڕایەوە و وتی:

- (باوەڕم بەم قسانەت نییە! چۆن دەگونجێ ئەم وڵاتە ئاوەدانە لەناو ببرێت و دانیشتووانیشی بۆ وڵاتێکی تر بڕۆن و بگوێزرێنەوە)؟

هاوڕێ ئامۆژگار و بێ وەی و دڵسۆزەکەی پێی وت:

(١) ئاماژەیە بۆ وەرزەکانی ساڵ، ئەوەتا وەرزی "بەهار" وەك شەمەندەفەرێك وایە کە لە جیهانی پەنهانی غەیبەوە هاتبێت و، بە پڕی خواردەمەنی و ئازووقەی لێ بارکرابێت. (دانەر)

- (مادەم تۆ ئاوا سەرپێچی لە "ڕاستی" دەکەیت و لەسەر بۆچوونی خۆت هەر سوور و بەردەوامیت، ئەوا وەرە با بە کورتی و لە نێوان "دوازدە وێنە"دا ئەوەندە بەڵگەی لەژمارە بەدەرت بۆ ڕوون بکەمەوە کە هەر هەموویان - بە بێ گومانی- بوونی: دادگایەکی یەکجار مەزن و.. خانەیەکی پاداشت دانەوە و.. لانەیەکی تۆڵە و بەندی و سزات بۆ دەچەسپێنن و، دەری دەخەن کە هەروەك ڕۆژ لە دوای ڕۆژ وڵات لە دانیشتووانی خاڵی دەکرێتەوە، هەر بەو جۆرەش ڕۆژێك دێت کە بە یەکجارەکی ئەم خاکەیان لێ چۆڵ دەکرێت و ئەم وڵاتەش بە تەواوی وێران دەبێت).

❑ **وێنەی یەکەم:**

ئایا دەگونجێ وڵاتێکی خاوەن پادشا - بە تایبەت پادشانشینێکی مەزنی وەك ئەمە - پاداشتی بۆ گوێ ڕایەڵان و تۆڵە و سزایشی بۆ یاخی بووان تێدا نەبێت؟

خۆ مادەم ئەم سزا و پاداشتە لەم خانەیەدا لە حوکمی "نەبوو"دایە، ئەوا بێ گومان دەبێ دادگایەکی تەواو مەزن لە خانەیەکی تردا هەبێت تاکو ئەو تۆڵە و پاداشتانە دەستنیشان بکات!

❑ **وێنەی دووهەم:**

سەرنج لە ڕەوتی ڕووداوەکان و بەڕێوەبردنی کاروباری ناو وڵات بدە و بزانە: چۆن ڕزق و ڕۆزیی زۆر و بەلێشاو بەسەر هەموو بوونەوەرێکدا، تەنانەت بەسەر هەژارترین و لاوازترینیاندا دابەش دەکرێت و.. بۆ گشت بیمارێکی بێ کەس و بێ نەوا بڕوانە و ببینە کە چۆن چاودێریی تەواو و دڵنەوایی بەردەوامیان بۆ فەراهەم هێنراوە و.. سەیری ئەو خواردەمەنی‌یە نایاب و، دەفرە ڕەنگین و، مەدالیا قەشەنگ و، پۆشاکە نەخشاوانە بکە و.. تەماشاکە: سفرە و خوانی پڕ لەو خواردەمەنی‌یە بەتام و چێژ و نایابانە لە هەموو شوێنێکدا ڕاخراون.. ئنجا بڕوانە: هەموو یەکێ لەو خەڵکە، کاری سەرشان و ئەرکی ئەستۆیان زۆر بە ڕێکوپێکی ئەنجام دەدەن و، جگە لە گێل و بێ ئاگایانی چەشنی تۆ، دەنا کەسیان بە ئەندازەی سەرە پەنجەیەکیش لە سنووری خۆیان لانادەن. چونکە مەزنترین کەس بەوپەڕی لەخۆبوردەیی و ڕێز و نەوازش و، لەوپەڕی گوێڕایەڵی و ملکەچی‌دا و، لە سایەی سام و شکۆی ئەو پادشایی‌یەدا، ئەرکی سەرشانی خۆی ڕادەپەڕێنێت. کەواتە خاوەن و پادشای ئەم وڵاتە، دارای:

"کەرەم"ێکی مەزن و..

"میهرەبانی"یەکی فراوان و..

"عیززەت"ێکی بڵند و..

"غیرەت"ێکی شکۆداری ئاشکرا و..
"شەرەفمەندی"یەکی تابلێی بەرز و باڵایە!
خۆ ئاشکرایشە:
"کەرەم" داخوازی: "نیعمەت بەخشین"ە و..
"میهرەبانی"ش بە بێ: "چاکەکاری" نایەتەدی و..
"عیززەت"یش داوای بوونی: "غیرەت" دەکات و..

"شەرەفمەندی"ی بەرز و باڵایش داواکاری: تەمێ کردنی هەموو ئەو کەسانەیە کە بە چاوی سووکەوە سەیری ئەم کارە مەزنانە دەکەن و بە: گاڵتەجاڕی و، هەڕەمەکی و، بێ مەبەستیان دادەنێن.

کەچی – لەگەڵ ئەمەشدا – کە بە وردی سەرنج دەدەین، دەبینین: بەشێکی کەمی یەك لە هەزاری ئەو شتانەی کە شایستەی ئەو "میهرەبانی" و داخوازی ئەو "شەرەفمەندی"یەن، لەم وڵاتەدا نایەنەدی، ئەوەتا بابای ملهوڕی ستەمکار بە لووت بەرزی و زەبر و زەنگەوە بێرەدا دەگوزەرێت و دەڕوات و، کاکی ستەم لێکراویش بە زەلیلی و لارەملی و شان کزی و دڵشکاوی، ملی ڕێ دەگرێتەبەر و لەم وڵاتە کۆچ دەکات!

کەواتە – بێ هیچ گومانێك – کێشەی ئەمانە، بۆ دادگایەکی گەلێ مەزنتر هەڵگیراوە و دواخراوە.

**☐ وێنەی سێهەم:**

سەیر بکە و بزانە: چۆن هەرچی کار و فرمانی ناو ئەم وڵاتە هەن، تێکڕا بە:
"دانایی"یەکی لە ڕادەبەدەر و.. "ڕێسا"یەکی ناوازە، ئەنجام دەدرێن..
ئنجا سەرنج بدە کە چۆن لە ڕوانگەی:

"دادگەری"ی ڕاستەقینە و.. بە: "تەرازوو"ی سەرنەکەری هەستیار، سەیری مامەڵە و ڕەفتارەکانی کەسانی ناو وڵات دەکرێت.

دیارە "دانایی" و ژیریی حکوومەت لەوەدایە کە چاوپۆشی و نەرم و نیانی و ڕێزی زۆر لەگەڵ ئەو کەسانەدا بنوێنێت کە هانای بۆ دەبەن و.. ئنجا "دادگەری"یە خاوێن و بێ گەردەکەشی داخوازی پاراستن و چاودێری کردنی گشت مافەکانی هاوولاتیانیەتی، تاکو سام و شکۆی حکوومەت ڕاگیر بکرێت و، مەزنی و پایەداریی دەوڵەتیش بپارێزرێت..

کەچی لەو شتانەی کە شایستەی ئەو "دانایی" و داخوازی ئەو "دادگەری"یەن، بەشێکی یەکجار کەم نەبێ، هیچیتر دەرناکەوێت لێرەدا جێبەجێ بکرێت، ئەوەتا بێئاگایانی چەشنی تۆ بێرەدا گوزەر دەکەن و ئەم وڵاتە بەجێ دەهێڵن، بێ ئەوەی زۆربەیان سزای ڕەفتارە چەواشەکانیان بچێژن!

کەواتە یەکلایی کردنەوەی ئەم چەشنە کێشانە، بۆ دادگایەکی گەلێ مەزنتر دواخراوە.

### ❒ وێنەی چوارەم:

سەیری ئەو گەوهەرە بێ وێنە و نایابانە بکە کە لەم پیشانگایانەدا پێش‌چاو خراون..

بۆ ئەو خواردەمەنی‌یە خۆش و بەتام و ناوازانە بڕوانە کە ئەم هەموو سفرە و خوانانەیان پێ ڕازێنراوەتەوە!

ئەمانە، دەری دەخەن کە: پادشای ئەم وڵاتە دارای "سەخاوەت"ێکی بێ سنوور و.. "گەنجینە"یەکی پڕاوپڕی بێ کۆتایی و نەبڕاوەیە.

خۆ ئەم چەشنە سەخاوەتمەندی‌یە بەردەوام و گەنجینە نەبڕاوانەش - بێ هیچ گومانێك - داخوازی بوونی: میوانخانەیەکی نەمر و هەمیشەیی ئەوتۆن کە هەرچی حەز و خواست و ئارەزووی دەروونی مرۆڤە، لەسەر سفرە و خوانەکانی ئەوێدا ئامادە کرابن و بۆ مرۆڤ دانرابن..

هەروەها داخوازی ئەوەشن کە: هەموو ئەو میوانانەی نیعمەتی پادشایان پێ دەبەخشرێت و تامی نیعمەت و بەخششەکانی ئەو دەچێژن، ئەوانیش - بە هەمان شێوە - هەمیشەیی و هەتاهەتایی بن و ئازاری جودایی و لێکبڕانیان دەرخوارد نەدرێت، چونکە هەروەك "نەمانی ئازار" لە خۆیدا تام و لەزەتێکی سەربەخۆیە، "نەمانی تام و لەزەت و چێژە خۆشەکان"یش - بە هەمان پێوەر - ئازارێکی یەکجار بەسۆ دەرخواردی ناخی مرۆڤ دەدات!

ئنجا سەیری ئەم پیشانگایانە بکە و.. سەرنج لەو بڵاوکراوە و ڕاگەیاندنانە بدە و.. گوێ لەو "بانگەوازکارانە" ڕابگرە کە لە بارەی لایەنە سەرسوورهێنەرەکانی دروستکراوانی پادشای خاوەن موعجیزاتەوە دەدوێن و وەسفی یەك بە یەکیان پێش‌چاو دەخەن و "کەماڵ"ی پادشا و "جوانی"یە مەعنەوی‌یە بێ‌وێنە و ناوازەکەی ئاشکرا دەکەن و، سەرگەرمی باس و لێدوانی لایەنە ورد و ناسك و ڕەنگینەکانی جوانیی پەنهانی ئەون.

کەواتە ئەم پادشایە دارای "کەماڵ"ێکی ڕوون و "جوانی"یەکی گەشی مەعنەویی ئەوتۆیە کە هەستی سەرسووڕمان لای سەرنجدەرانیان بورووژێنن!

ئنجا گومانیش لەوەدا نی‌یە کە ئەو "کەماڵ"ە پەنهانە بێ خەوش و دوور لە ناتەواوی‌یەی پادشا، داخوازی ئەوەیە کە: لە بەرچاوی بینەرە ڕێزلێگر و سەرسووڕماوە نرخ زانەکانی‌دا ئاشکرا بکرێت و پێش‌چاو بخرێت.. "جوانی"یە نادیار و بێ وێنە و ناوازەکەشی داواکاری ئەوەیە کە: ببینرێت و لە بەرچاواندا دەربکەوێت. واتە داخوازی ئەوەیە کە لە دوو ڕووەوە "جوانی"یەکەی ببینرێت:

یەکەمیان: هەر پادشا بۆخۆی جوانی‌یەکەی خۆی لە چەندەها ئاوێنەی جوانی‌دەرەوەی جۆراوجۆردا ببینێتەوە.

دووهەمیان: بینینی ئەو جوانی‌یەی خۆی بە چاوی ئەوانەی کە بۆ سەیر کردنی ئەم پیشانگایە هاتوون و، تەماشاکەرانی تاسەمەند و کەسانی موشتاقی ئەو جوانی‌یەن!

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە: ئەو "جوانی‌یە هەمیشەیی"یە داواکاری: بینین و ئاشکرابوونە و، دەشیەوێت بە هەمیشەیی ببینرێت و خۆیشی ببینێت. دیارە ئەمەش – بێ‌گومان – داخوازی: "هەمیشەیی" و "هەتاهەتایی"ی کەسانی بینەری تاسەمەند و ڕێز لێگر و نرخ شناسانی ئەو جوانی‌یەیە، چونکە "جوانیی هەمیشەیی و نەمر" بە موشتاق و تاسەمەندی لەناوچووی فانی ڕازی نابێت!

ئنجا لەبەر ئەوەی کەسێ کە بڕیاری نەمانی لەسەر دەرکرابێت، هەر تەنها بیرکردنەوەی لەو نەمانەی کە لە ڕێی‌دایە، "خۆشەویستی"یەکەی ناو دڵی دەگۆڕێت بە "دوژمنایەتی" و، سەرسووڕمانەکەشی بە: "سووك سەیرکردن" و، "نرخ شناسی"یەکەشی بە: "ڕێز لێ نەگرتن"، چونکە مرۆڤ – بە سروشت – گەر شتێك نەزانێت و پەیی پێ نەبات، ئەوا دوژمنایەتیی دەکات و لە نرخی دادەگرێت..

جا لەبەر ئەمە و، مادەم هەموو ئەو کەسانەش کە دێنە ئەم پیشانگا و میوانخانەیە، خێرا و بە پەلە و بێ ئەوەی لە نووری ئەو "جوانی" و "کەماڵ"ە تێر ببن و تاسە و تینوێتی‌یان لێی بشکێت، دەڕۆن و بەجێی دەهێڵن، بگرە لە ماوەی چەند چرکەیەکدا چەند سێبەرێکی کەمی کز نەبێت هیچی‌تریان لێ نابینن، ئەوا – بێ هیچ گومانێك – کۆچی ئەو گەشتیارانە بەرەو دیمەنگایەکی نەمری هەتاهەتایی وەهایە کە لەوێدا بە هەمیشەیی و کامی دڵ شاد و بەهرەمەندی ئاواتەکانیان دەبن!

**❐ وێنەی پێنجەم:**

سەرنج بدە و بزانە کە: چۆن ئەم پادشا (ناوازەیە) دارای "میهرەبانی"یەکی ئەوەندە مەزنە کە لە گەرمەی ئەم هەموو کار و ڕووداوانەدا ئەو "میهرەبانی"یەی دەردەکەوێت. ئەوەتا فریای هانا بۆبەرانی دەکەوێت و، بەدەم پەنا بۆهێنەرانیەوە دەڕوات و، بچووکترین پێداویستیی ئاسایی‌ترین کەسی وڵاتەکەی – بەوپەڕی سۆز و میهرەوە – جێ‌بەجێ دەکات. ئەمەش لە ڕادەیەکی وەهادایە کە تەنها بۆ فریاگوزاریی زامی قاچی یەك سەر "مەڕ"ی شوانێك مەڵهەم و دەرمان و بەیتاڵی پێویست پەیتا پەیتا ئامادە دەکات.

وەرە – ئەی هاوڕێکەم! – با پێکەوە بۆ ئەو دوورگەیە بڕۆین کە حەشاماتێکی زۆری تێدا جەم بووە و، گشت کەسانی بەڕێز و پایەداری وڵاتی تێدا کۆبوونەتەوە.. بڕوانە! ئا ئەوە

نوێنەرێکی بەڕێزی پادشایە هاتووە و مەزنترین مەدالیای خەڵاتکراوی پۆشیوە و، لەناو ئەو خەڵکەدا وتار دەدات و، داوای چەند شتێك لە پادشای بەسۆز و میهرەبانی دەکات و، ئنجا ئەو حەشاماتەش لەو داواکاری‌یانەی‌دا پشتی دەگرن و هەمان خواست و ویست لە پادشایان دەخوازن.

فەرموو گوێ لە وتەکانی ئەو نوێنەرە خۆشەویستەی پادشای مەزن رابگرە، ئەوەتا بە ئەدەبێکی گەلێ زۆر و لالانەوەیەکی یەکجار بەکوڵەوە دەپاڕێتەوە و دەڵێت:

- (ئەی پادشای ئێمە! ئەی ئەو کەسەی نیعمەتە رواڵەتی و پەنهانەکانی خۆی بەسەردا پەخشاندووین! ئێمە لە پایەی مەزنی و شکۆداریی پادشاییت داواکارین کە: هەروەك ئەو نموونە و سێبەرانەت لەم پیشانگایەدا پێش‌چاو خستین، سەرچاوە و بناغەکانیشیانمان لە شوێنی خۆیاندا پیشان بدەیت.. بمانبە بۆ بارەگا و مەڵبەندی پادشایی خۆت و لەم دەشتایی‌یە وشك و برنگەدا لەناومان مەبە.. لە دیوان و مەڵبەندی حوزووری خۆتدا وەرمان بگرە و بەزەییت پێماندا بێتەوە.. لەوێ ئەو تام و لەزەتانەمان دەرخوارد بدە کە لێرەدا تامی نموونەکانیانت پێ چەشتین.. بە ئازاری: دەرکراوی و دووری لە خۆتەوە، سزامان مەدە.. ئەوەتا هەموو ئەوانە گەل و هاوولاتی‌یانی تاسەمەند و سوپاسگوزار و گوێڕایەڵی تۆن، دەسا بێ‌خاوەن و سەرگەردانیان مەکە و، بە مردنێك کە گەڕانەوە و زیندووبوونەوەی لە دوا نەبێت، مەیان فەوتێنە).

ئایا گوێت لێ بوو - ئەی هاوڕێکەم! - ئەو نوێنەرەی پادشا بە ناوی ئەو حەشاماتەوە چیی وت و چ داواکاری‌یەکی پێشکەشی پادشا کرد؟

باشە ئایا دەگونجێ پادشایەك ئەم هەموو "توانا" لەڕادەبەدەر و "میهرەبانی"یە هەمەلایەنگیرەی هەبێت، داخوازی‌یەکانی ئەو نوێنەرە بەڕێزەی خۆی نەبەخشێت و، بە هانای مەزنترین و بەرزترین ئامانج و مەبەستەکانیەوە نەڕوات و نەیهێنێتەدی؟ لە کاتێکدا کە - هەر ئەم پادشایە - بەوپەڕی بایەخ پێدانەوە نزمترین ئارەزووی بچووکترین کەسی ناو ولاتەکەی جێ‌بەجێ دەکات؟ لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجامدانی داواکاری‌یەکانی ئەو نوێنەرە بەڕێزەی، گشت ئاوات و ئامانجەکانی هەموانی پێ دێنەدی و، ئنجا "دادگەری" و "میهرەبانی" و "ڕەزامەندی"ی خۆیشی داخوازی هێنانەدیی ئەو داواکاری‌یانەن.. پاشان ئەو داخوازی‌یانە بۆ توانستی پادشا گەلێ ئاسانن و هەرگیز لەو نموونانە قورس و گرانتر نین کە لە باخچە و پیشانگاکانی ئەم ولاتەدا پێش‌چاوی خستوون؟

جا مادەم ئەو هەموو خەرجی‌یە زۆر و زەبەندانەی لە دروستکردنی ئەم ولاتەدا و بۆ مەبەستی پیشاندانێکی کاتیی نموونەکانی سنعەتی خۆی سەرف کردووە، ئەوا بێ هیچ

گومانێك، لـە مەڵبەندی پادشـایەتیی خـۆیدا لــە گەنجینــە ڕاسـتەقینەکانی خـۆی و لایەنـە سەرسووڕهێنەرەکانی ئەو سنعەتانەی، شتانی وا دەخاتە پێش‌چاوی بینەران کە ژیریی مرۆڤ سەرسام بکەن.

کەواتـە، ئـەو کەسـانەی ئێسـتا وان لـەم تاقیکردنەوەیـەدا، بـە هەڕەمـەکی و بـێ مەبەسـت نەهێنراونەتە ئێرە، بەڵکو ئەوانە یان کۆشکەکانی بەختەوەریی هەمیشەیی چاوەڕوانیانـە.. یـان بەندیخانە سامناکە هەتاهەتایی‌یەکان!

❑ وێنەی شەشەم:

وەرە بۆ ئەم شەمەندەفەرە مەزن و، فرۆکـە پڕاوپڕ و، گەنجینـە و عـەمبارە گـەورە لێـوان و، پیشانگا قەشەنگ و سەرنج ڕاکێشانە بڕوانە..

بیر لە بەڕێوەبردن و ڕەوتی کاروبارەکان بکەرەوە!

ئەوەتا هەموو ئەمانە دەری دەخەن کە:

لە ڕاستیدا دەستەڵاتداری و پادشایی‌یەکی مەزن هەیـە[1] لـە پشتی پـەردەوە حوکمڕانیـی

---

(١) هەروەك چۆن لەم سەردەمەداسوپای مەزن لە گۆڕەپانی مانۆڕ و کاتی دەست دانە جەنگدا، هـەر تەنـها بە وەرگرتنی فەرمانی: "چەکـەکانتان هـەڵبگرن.. نێزەکانیـان لەسـەر قـایم بکـەن" وەك دارسـتانێکی چـڕی دڕکاویی لـێ دێت.. هەروەها وەك لە هەموو جەژن و نمایشێکی سەربازیدا سەرجەمی سەربازگە تەنـها بە وەرگرتنی فـەرمانی: "نیشـانەکانتان بپۆشـن و مـەدالیاکانتان بـە بـەرۆکدا بکـەن" تێکڕا وەك باخچەیــەکی جوانی پڕ لە گوڵزاری ڕەنگین دەخەملێت.. هەروەك ئەمانە وان، ڕووەکە بێ هەستەکانیش کـە – چەشنی مەلائیکەت و جینني و مرۆڤ – جۆرێکی نەبڕاوە و بێ‌کۆتایی سـەربازەکانی خـوای گـەورەن، هـەر کـە لـە کاتی جیهاد و تێکۆشانیاندا بۆ پاراستنی ژیانیان فـەرمانی: "کـن فیکـون"یـان پێ‌دەگـات و بەجێـهێنانی ئـەم فەرمانەی خوای گەورەیان دەخرێتە ئەستۆ کە: "بۆبەرگری‌کردن لە خۆتان چەك و تفاقتـان هـەڵبگرن" ئـەوا گشت درەختە مەزن و دەوەنە دڕکاوی‌یەکان ڕمەکانیان ئامادە دەکەن و، سەرانسەری گۆی زەویـش وەك سەربازگەیەکی یەکجار فراوان و مەزنی لـێ دێت کە سەربازەکانی بە چەکی دەستی پڕچەك کرابن. ئەوەتا هـەموو ڕۆژ و حەفتەیـەکی بـەهار وەك جـەژنی دەسـتە و کۆمـەڵێکی ڕووەك وایـە و، هــەموو تیرەیــەکی ڕووەکەکانیش – وەك نمایشی سەربازی – ئەو دیاری‌یە بەنرخ و مـەدالیا قەشـەنگ و ڕازاوانـە لـە بـەرچاوی پادشای ئـەزەلی و مەلائیکەتانی بینەر و شـایەتی‌دەریدا دەپۆشـن کە پادشـایان پێـی بەخشیون. وەك بڵـێی فـەرمانێکیان لـە لایـەن پەروەردگاریانـەوە بـەگوێدا درابێـت کـە: "نـەخش و نیگـارە ڕازاوەکـانی سـنعەتی پـەروەردگار و، مـەدالیا قەشـەنگەکانی سرووشـتی خوایـی – کـە گـوڵ و بەروبوومـەکانن – بپۆشـن و بـا گوڵـەکانتان دەمیــان بپشـکوێت" ئیـتر هـەر بـە بیسـتنی ئـەم فەرمانــە، سەرانســەری گــۆی زەوی وەك سەربازگەیەکی مەزنی لـێ دێت لە جەژنێکی ڕازاوەی خۆشدا و، چەشنی نمایشێکی سەربازی لە بەرچاودا خۆی دەنوێنێت، کە نیشانە و مەدالیا ڕەنگینەکانی تێدا بریسکێنەوە.

جـا ئـەم گشـت پڕچەك کردنـەی ڕووەك، کـە تـا ئـەم ئەندازەیـە بـە دانـایی و ڕێکـی ئـەنجام دەدرێـت و.. ئـەم ئارایشتدانەی کە لە ڕادەی ناوازەیی‌دایە.. بۆ هەموو خاوەن چاوێکی بینەری دەردەخەن کە تێکڕا فـەرمانی

خۆی ده‌كات. جا پادشایی و ده‌سته‌ڵاتداریی ئاوا مه‌زن - بێ هیچ گومانێ - داخوازی ئه‌وه‌یه‌ كه‌ خاوه‌نی میلله‌ت و ڕه‌عیه‌تی شایانی خۆی بێت. به‌ڵام ئه‌وه‌ی كه‌ به‌ چاو ده‌بینرێت هێشتا شایانی ئه‌و پادشایی و فه‌رمانڕه‌واییه‌ نی‌یه‌، چونكه‌ ئه‌وه‌تا:

ئه‌و میلله‌ت و ڕه‌عیه‌تانه‌ له‌م "میوانخانه‌"یه‌دا - واته‌ میوانخانه‌ی دنیا - كۆبوونه‌ته‌وه‌، كه‌چی بێ ئه‌وه‌ی ئه‌وان بحه‌وێنه‌وه‌، ئه‌م میوانخانه‌یه‌ هه‌موو ڕۆژێك چه‌ند ده‌سته‌یه‌ك میوان به‌ڕێ ده‌كات و له‌ پێشوازیی چه‌ند ده‌سته‌یه‌كی تری نوێدایه‌!

هه‌روه‌ها ئه‌وان ئێستا له‌م "گۆڕه‌پانی تاقیكردنه‌وه‌"یه‌دا ئاماده‌ بوون، به‌ڵام هه‌موو سه‌عاتێك ئه‌م گۆڕه‌پانه‌ش ئاڵوگۆڕی به‌سه‌ردا دێت..

هه‌روه‌ها میوانه‌كان ماوه‌یه‌كی كه‌م له‌م "پیشانگا" مه‌زنه‌دا ده‌مێننه‌وه‌ و سه‌یری نموونه‌كانی نیعمه‌ته‌ به‌نرخه‌كانی پادشا و لایه‌نه‌ سه‌رسووڕهێن و ناوازه‌كانی سنعه‌تی نایابی ئه‌و ده‌كه‌ن، كه‌چی پیشانگاكه‌ش هه‌موو خوله‌كێك ده‌گۆڕێت و، ئه‌وه‌ی ده‌ڕوات نایه‌ته‌وه‌ و، ئه‌وه‌ش تازه‌ دێته‌ ناوی - وه‌ك ئه‌وانه‌ی پێشوو - كۆچ ده‌كات و ناگه‌ڕێته‌وه‌!

هه‌موو ئه‌م شتانه‌ و ڕه‌وتی ئه‌م كارانه‌، به‌ شێوه‌یه‌كی بێ گومان، ده‌ری ده‌خه‌ن كه‌:

له‌ پشتی ئه‌م میوانخانه‌ كاتی و.. گۆڕه‌پانه‌ ئاڵوگۆڕ بووانه‌ و.. له‌ دوای ئه‌م پیشانگا هه‌میشه‌ گۆڕاوانه‌وه‌، چه‌ندین كۆشك و ته‌لاری هه‌میشه‌یی و خانه‌ و لانه‌ی هه‌تاهه‌تایی و به‌هه‌شت و گه‌نجینه‌ی پڕاوپڕ (له‌ ڕاستی و ئه‌سڵ و بناغه‌كانی ئه‌م نموونانه‌ی ئێره‌) هه‌ن، كه‌ پادشا بۆ ڕه‌عیه‌ت و میوانه‌كانی خۆی ئاماده‌ی كردوون.

كه‌واته‌ ئیش و كاره‌كانی ئێره‌، ته‌نها له‌ پێناوی ئه‌و پاداشتانه‌دان كه‌ له‌وێ ئاماده‌ كراون و، پادشا لێره‌ ئه‌رك و فرمان به‌ ڕه‌عیه‌ته‌كه‌ی ده‌سپێرێت و له‌وێیش پاداشتیان ده‌داته‌وه‌. ئنجا هه‌موو یه‌كێ له‌وان به‌پێی توانا و لێهاتنی خۆی و به‌ گوێره‌ی ئه‌و كرده‌وه‌ چاكانه‌ی كه‌ لێره‌دا پاشه‌كه‌وتی كردوون، له‌وێ به‌جۆره‌ به‌خته‌وه‌رییه‌كی تایبه‌تی خه‌ڵات ده‌كرێت.

❑ **وێنه‌ی حه‌وته‌م:**

وه‌ره‌! با كه‌مێ به‌ناو كه‌سانی میللی(مه‌ده‌نی)ی ئه‌م وڵاته‌دا بگه‌ڕێین و هه‌ندێ سه‌رنجی باری ژیان و ده‌وروبه‌ریان بده‌ین.. بڕوانه‌! وا له‌ هه‌موو گۆشه‌یه‌كدا چه‌ندین كامێرای وێنه‌گرتن دانراون، وێنه‌ی شتان ده‌گرن و، له‌ هه‌موو شوێنێكدا كه‌سانی نووسه‌ری زۆر هه‌ن كه‌ گشت شتێك، ته‌نانه‌ت شته‌ كه‌م بایه‌خه‌كانیش، تۆمار ده‌كه‌ن..

---

پادشا و حوكمڕانێكی به‌توانای وه‌ها جێبه‌جێ ده‌كه‌ن كه‌ توانستی ئه‌و كۆتایی نی‌یه‌ و، دانستیشی بێ سنووره‌. ( دانه‌ر )

فەرمووو سەیری ئەو چیا بەرزە بکە، ئەوەتا کامێرایەکی گەلێ مەزنی لەسەر قایم کراوە کە تایبەتە بە پادشا خۆیەوە[١]، وێنەی هەموو ئەو شتانە دەگرێت کە لەم وڵاتەدا ڕوو دەدەن، چونکە پادشا فەرمانی داوە کە سەرجەمی ئەو شت و کاروبار و مامەڵانەی لەناو وڵاتەکەیدا ڕوو دەدەن تێکڕا تۆمار بکرێن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پادشای مەزن خۆی نەخشەی ڕووداوەکان دەکێشێت و فەرمان بە تۆمارکردنیشیان دەدات..

جا ئەم بایەخدانە گرنگ و پارێزگارییە وردەی شتانی ناو وڵات - بێ هیچ گومانێك - بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە: هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارێك لێپرسینەوەی لە دوا هەیە. چونکە ئایا دەگونجێ فەرمانڕەوایەکی پارێزگار کە سادەترین مامەڵەی بچووکترین ڕەعیەتی خۆی پشت گوێ نەخات، کارە مەزنەکانی ڕەعیەتە گەورەکانی نەپارێزێت و تۆماریان نەکات و لەسەر کردەوەکانیان لێیان نەپرسێتەوە و پاشان سزایان نەدات؟ لە کاتێکدا کە ئەو گەورە ڕەعیەتانەی ڕەفتاری وایان لێ دەردەکەوێت کە یەخەی مەزنیی ئەو دەگرێتەوە و، میهرەبانیی فراوانیشی دەست بە ڕووی ئەو ڕەفتارانەیانەوە دەنێت؟!

جا مادەم ئەوانە لێرەدا لەسەر کردەوەکانیان سزا نادرێن، ئەوا - بێ گومان - سزاکەیان بۆ دادگایەکی گەلێ مەزن دواخراوە.

**❐ وێنەی هەشتەم:**

وەرە! با ئەو فەرمانانەت بۆ بخوێنمەوە کە لە لایەن پادشاوە دەرچوون.. بڕوانە! وا پادشا "بەڵێن" و "هەڕەشەکانی" پەیتا پەیتا دووپات دەکاتەوە و ڕایدەگەیەنێت کە:

(دەتانهێنم بۆ مەڵبەندی پادشایی و دەستەڵاتداریی خۆم و، بەختەوەری بە گوێڕایەڵانتان دەبەخشم و، بێ گوێ و سەرکەشانیشتان لە بەندیخانەدا توند دەکەم و، ئەم شوێنە کاتییەش

---

(١) هەندێ لەو واتایانەی کە ئەم وێنەیە ئاماژەیان بۆ دەکات، لە "ڕاستیی حەوتەم"دا ڕوون کراونەتەوە. بۆ نموونە ئەو کامێرا مەزنە تایبەتییەی پادشا، ئاماژە بۆ "لوح المحفوظ" و ڕاستیی ئەو لەوحە دەکات. ئنجا وتەی "بیست و شەشەم"یش "لوح المحفوظ"ی چەسپاندووە و، بوونی ئەو لەوحە بەمەی خوارەوە چەسپاوە: هەروەك ناسنامە کەسییە بچووکەکان هێمان بۆ بوونی تۆمارێکی مەزنی ناسنامەکان و.. قەواڵە بچووکەکانیش دەری دەخەن کە تۆمارێکی مەزن هەیە هەموو قەواڵەکانی تێدا تۆمار کراوە و.. نمە وردیلەکانی دڵۆپە بچووکەکانیش بەڵگەن لەسەر بوونی کانیاوێکی مەزن.. هەروەك ئەمانە وان، بە هەمان جۆریش یەكبەیەکی: هێزی پارێزەر(حافظة)ی مرۆڤ کە زانیارییەکانی مرۆڤی تێدا دەپارێزرێن و.. بەری درەختەکان و.. تۆوی بەرەکان، وەك ناسنامەی بچووك بچووك وان و، لە واتای چەند "لوح المحفوظ"ێکی بچکۆلەدان و، لە شێوەی چەند نمێکی هەندێ دڵۆپی بچووکدا دەردەکەون کە نم نم لەو پێنووسەوە داچۆڕاون کە "لوح المحفوظ"ی مەزنیان پێ نووسراوە. لەبەر ئەوە، هەموو یەکێ لەمانە مرۆڤ وا لێ دەکەن کە بە بێ گومانی هەست بە بوونی "حافظة"یەکی مەزنتر و، تۆمارێکی گەورەتر و، لەوحی مەحفووزی هەرە مەزن بکات و، ئەمانەی بۆ دەچەسپێنن و بۆ عەقڵە تیژە بێدارەکانیان دەخەنە ڕوو. (دانەر)

دەرووخێنم و وڵاتێكی تری نوێ بنیات دەنێم كە چەندین كۆشك و تەلاری هەتاهەتایی و بەندیخانەی هەمیشەیی تێدا بێت).

ئەوەش بزانە كە جێبەجێ كردنی ئەم بەڵێنە بە لای پادشاوە گەلێ ئاسانە و، لە هەمان كاتدا تابڵێی گرنگ و جێی بایەخیشە بۆ ڕەعیەتەكانی. ئنجا نەبردنەسەری بەڵێن كارێكە بە یەكجاری پێچەوانە و دژی عیززەت و توانستی پادشایە.

دەسا ئەی هاوڕێی بێئاگام! تۆ چەندە سەیریت! دەچیت درۆ و دەلەسەكانی وەهمی خۆت و وڕێنەكانی عەقڵت و فێڵ و تەڵەكەكانی نەفست بە ڕاست دەزانیت، كەچی تەسدیقی ئەو كەسە ناكەیت كە هەرگیز ناچاری بێ وەعدی نابێت و بە هیچ جۆرێك توخنی بەڵێن شكاندن ناكەوێت و هەموو شتێك شایەتی لەسەر ڕاستیی ئەو دەدات.

بێ گومان تۆ بەم ڕەفتارەت خۆت شایانی تۆڵەیەكی گەلێ گەورە دەكەیت و، لەم هەڵوێستەتدا لەو ڕێبوارە نەزانە دەچیت كە لە ئاستی ڕووناكیی خۆردا چاوی دەنووقێنێت و بە ڕێنمایی ئەندێشەی خۆی هەنگاو دەنێت و، دەیەوێت بە ترووسكایی عەقڵە كزەكەی خۆی -كە چەشنی گوڵەستێرە، ڕووناكییەكی كەم نەبێ زیاتر شك نابات – ڕێی تاریك و سامناكی بەردەمی ڕووناك بكاتەوە!

جا مادەم ئەو پادشایە بەڵێنیداوە، ئەوا – بێ هیچ گومانێك – بەڵێنەكەی دەباتە سەر. چونكە بردنەسەری بەڵێنی گەلێ بەلاوە ئاسانە و، یەكێكە لە داخوازییەكانی پادشایی و دەستەڵاتدارییەكەی و، بۆ ئێمەش و بۆ هەموو شتێكی تری ناو وڵاتیش خواستی دڵ و كارێكی یەكجار پێویستە.

كەواتە، دوای ئەم وڵاتە كاتییە، دادگایەكی مەزنتر و بەختەوەرییەكی گەورەتر هەیە.

**☐ وێنەی نۆهەم:**

ئێستا وەرە! با تەماشای بەشێك لە سەرۆكەكانی[1] ئەم فەرمانگە و كۆمەڵانە بكەین. ئەوەتا هەندێكیان دەتوانن ڕاستەوخۆ بە تەلەفۆنی تایبەتی پەیوەندی بە پادشای مەزنەوە بكەن، تەنانەت هەندێك لەو سەرۆك فەرمانگەیانە پلەی ئەوەندە بڵند و باڵایە كە بۆ دیوانی حوزووری خاوێن و مەزنی پادشا بەرزبووەتەوە و بانگ كراوە..

سەرنج بدە و بزانە ئەوانە چی دەڵێن؟.. ئەوەتا هەر هەموویان ئەم هەواڵەمان پێ ڕادەگەیەنن كە: "پادشا جێیەكی گەورە و فراوان و ڕەنگینی بۆ پاداشت دانەوەی

(١) ئەو واتایانەی كە ئەم ئاماژەیە دەیانچەسپێنێت، دوایی لە "ڕاستیی هەشتەم"دا بە ڕوونی دەردەكەون. بۆ نموونە: سەرۆك فەرمانگەكانی ئەم نموونەیە هێمان بۆ: پێغەمبەران و ئەولیایان. مەبەست لە تەلەفۆنەكەیش ئەو نیسبەت و پەیوەندییە پەروەردگارییەیە كە لە دڵەوە ڕاكێشراوە، ئەو دڵەی كە "ئاوێنەی وەحی" و شوێنی لێ دەركەوتنی "ئیلهام"ە و، وەك مایكرۆی تەلەفۆن وایە. (دانەر)

چاکـەکاران و، شـوێنێکی تـری سـامناکی بـۆ تۆڵـە و سـزادانی خراپکـاران ئامـادە و تەرخان کردووە و، بۆ ئەمەش بەڵێنی تەواو ڕاسـت و بەهێز بـۆ کەسـانی چاکـەکار و، هەڕەشە و گوڕەشەی یەکجار توند و تیژ ئاراستەی بەد ڕەفتاران دەکـات". دیـارە پادشـایش گەلێ بـەرز و مـەزن و بـە عیزەت ترە لـەوەی کـە خۆی گرفتاری ڕسـوایی و زەلیلیی بێ وەعدی بکات. خۆ ئاشکرایشە کە ئەم هەواڵەی هەواڵدەران ڕایانگەیاند هـەواڵێکی ئـەوەندە یەك لـە دوای یـەك و زۆر و پشـت گـیراوە کـە گەیشـتووەتە ڕادەی "تـەواتور" و هـێزی یەکدەنگی و یەکبوون، چونکە هەر هەموو هەواڵدەران پێمان ڕادەگەیەنن کە: بارەگـای ئـەم دەستەڵاتداری و پادشاییەی کە لێرەدا شوێنەوار و ڕوخسارەکانی دەبینین، لە وڵاتێکی تری گەلێ دووردایە و، کۆشك و خانووبەرەکانی ئەم مەیدانی تاقیکردنەوەیەش تێکـڕا کـاتین و، لە پاشاندا دەگۆڕرێن بە چەند کۆشك و تەلارێکی هەمیشەیی و، ئـەم زەوییـەش لادەبرێـت و زەوییەکی تری نوێی لـە جێدا دادەنرێـت. چونکـە دەسـتەڵاتداری و فـەرمانڕەوایی ئـەم پادشـاییە مـەزن و هەمیشـەییەی کـە لـە شـوێنەوار و جێکارەکانیـەوە مەزنییەکـەی دەردەکەوێت، تەنها لەوەدا نییە کە بەسەر ئەم شتە فـانی و لەناوچوانـەدا زاڵ و دەسـتەڵاتدار بێـت، بەڵکو بەسـەر ئـەو شـتانەی کـە دارای سیفەتی: "مانـەوە و کـەماڵ و مـەزنی"ن، ئـەو دەستەڵاتەی هەمیشە هەر زاڵ و بەردەوام و جێگیر دەبێت.

کەواتە – جگە لەمە – مەنزڵ و خانەیەکی تر هەیـە و، دەبێ کـۆچ کردنـی ئێمـە و گشـت ئەو خەڵکەش بەرەو ئەو خانە و لانە و بارەگایە بێت.

**❐ وێنەی دەهەم:**

ئەمڕۆ جەژنێکی نـەورۆزی پادشـایانەیە[1] و، ئـاڵوگۆڕێك لـەم ڕۆژەدا ڕوودەدات و شتی سەیر و سەرسووڕهێنیش دەردەکەوێت..

وەرە با لـەم ڕۆژی جەژنە خۆشەدا پێکەوە بۆ ئەو دەشت و بیابانە بڕۆیـن کـە بـە گوڵـزاری جوان و ڕەنگاوڕەنگ خەملاوە و ئارایشـت دراوە.. بڕوانـە! ئـەوەتا خـەڵکییش بـەرەو ئـەوێ

---

(١) دوایی لە "ڕاستیی نۆهەم"دا ئەو شتانە دەبینیت کە ئەم وێنەیە بە هێما ئاماژەیان بۆ دەکات. چونکە – بۆ نموونە – ڕۆژە جەژنەکە ئاماژەیە بـۆ وەرزی بـەهار و، دەشتە بـە گوڵـزار ئارایشـت دراوەکـەش ئاماژەیـە بۆ گۆی زەوی لـە وەرزی بەهـاردا و، مەبەسـتیش لەو دیمەنە هەمیشـە ئاڵوگۆڕبوانـەی سـەر شاشـەکەش: ئـەو ڕزق و ڕۆزییـە جۆراوجۆرانـەی مرۆڤ و ئـاژەڵن کـە دوو وەرزی بـەهار و هـاوین بەرهـەمیان دەهێنـن و، بەدیهێنـەری بـەتوانای شـکۆمەند و دانـای خـاوەنی جوانـی تـەقدیریان دەکـات و، هـەردەم بـە ڕێکوپێکـی دەیانگۆڕێت و، بە میهرەبانیی بێ کەم و کووڕی و یەکجار تەواوی خۆیشی هەمیشـە نوێیـان دەکاتـەوە و، دەم بە دەم و کات لە دوای کات و هەر لە سەرەتای بـەهارەوە تـا کۆتـایی هـاوین بـە بـەردەوامی دەیاننێرێتـە سەر ڕووی زەوی. (دانەر)

دەڕۆن.. تەماشاکە! لێرەدا شتی سەیر ڕوو دەدات، نابینیت ئەو کۆشك و تەلار و خانووانە لە شوێنی خۆیاندا دەڕووخێن و پاشان شکڵ و شێوەیەکی تر دەگرنەخۆ؟! بە ڕاستی ئەم کارە گەلێ سەیر و دەراسایە! چونکە ئەو کۆشك و تەلار و خانووبەرانەی کە ڕووخان، وا یەکسەر لێرەدا سەرلەنوێ بنیات نرانەوە و ئەم دەشت و بیابانە چۆڵەش بوو بە شارێکی ئاوەدان!

بڕوانە! ئەم بیابانە هەموو سەعاتێك - چەشنی شاشەی سینەما - دیمەنێکی تازە و شێوەیەکی نوێی جیاوازت لەچاو شێوەی پێشوودا پیشان دەدات.. بە وردی سەرنج بدە تا ناوازەیی و قەشەنگیی ئەو ڕێسا وردەکارەت بۆ دەربکەوێت کە لەم شاشە سەیر و سەرسووڕهێنەدا بەرچاو دەکەوێت کە بە هەمیشەیی و خێرایی دیمەنەکان دەگۆڕێت و نوێیان دەکاتەوە، چونکە ئەو دیمەنانە ئەندێشەیی نین، بەڵکو دیمەنی ڕاستەقینەن و هەموو شتێك تیایاندا، بەوپەڕی وردی و تەبایی و شیاوی، جێی خۆی دەگرێت، بە ڕادەیەك کە دیمەنە ئەندێشەیی‌یەکانیش ناگەنە ئاستی ڕێکی و ناوازەیی و وردەکاریی ئەمان، تەنانەت گەر ملیۆنان سیحربازی کارامەش کۆ بینەوە هێشتا هەر ناتوانن ئەم کارە ناوازە و بێ وێنانە ئەنجام بدەن. کەواتە ئەو پادشایەی وا لە ئێمەوە دیار نی‌یە، گەلێ شتی ئاوا نائاسایی و لەعادەتبەدەری هەیە.

ئەی هاوڕێی سەرسامم! تۆ دەڵێیت: (چۆن ئەم وڵاتە مەزنە دەڕووخێنرێت و، پاشان سەر لە نوێ لە جێ‌یەکی تردا بنیات دەنرێتەوە)؟

ئەوەتا هەر لە بەرچاوی خۆتدا هێندە ئاڵوگۆڕی زۆر و سەرسووڕهێنەری وا دەبینیت کە عەقڵت وەری ناگرێت! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم خێرایی‌یەی لەم هەموو "کۆبوونەوە و جیابوونەوە" و "بنیاتنان و ڕووخاندن"ەدا هەیە، لە پێناوی مەبەست و ئامانجێکدایە، چونکە دەبینی خەرجیی دە ساڵی ڕەبەق تەنها بۆ کۆبوونەوەیەکی یەك سەعاتی سەرف دەکرێت! کەواتە خودی ئەم بارودۆخانە بۆ خۆیان لێرەدا ئامانج و جێی مەبەست نین، بەڵکو تەنها چەند نموونەیەکن بۆ مەبەستی پیشاندان و بەرچاوخستن لەم پیشانگا کاتی‌یەدا و، پادشا لێرەدا کارەکانی بە شێوەیەکی موعجیزە ئاسا کۆتایی پێ دەهێنێت، تاکو وێنەیان بگرێت و، ئەنجامەکانیان بپارێزرێن و هەڵبگیرێن و، چەشنی تۆمارکردنی ئەو شتانەی لە مەیدانی مەشق و مانۆڕی سەربازی‌دا ڕوو دەدەن، ئەمانیش تۆمار بکرێن. کەواتە کاروبار و مامەڵەکانی ئێرە، سەرلەنوێ لە شوێنی کۆبوونەوە مەزنەکەدا بەردەوام دەبێت و لە دیمەنگا هەرە مەزن و پیشانگا گەورەکەی ئەوێدا جارێکی تر پیشان دەدرێنەوە. واتە: ئەم بارودۆخە فانی و

لەناوچوانەی ئێرە، چەندین بەروبوومی هەمیشەیی و وێنەی نەمر و هەتاهەتایی لەوێدا بەرهەم دێنن.

کەواتە مەبەست لەم ئاهەنگانەی ئێرە دەستکەوتنی بەختەوەرییەکی مەزنترە و.. گەیشتنە بە دادگایەکی گەلێ گەورەتر و.. شادبوونە بە چەندین مەبەست و ئامانجی بەرز و بڵندی نادیار.

**❐ وێنەی یازدەهەم:**

وەرە ئەی هاورێ سەرسەختەکەم! با سواری فڕۆکەیەك یان شەمەندەفەرێك ببین و، بەرەو خۆرهەڵات یان خۆرئاوا – واتە ڕابوردوو یان داهاتوو – بڕۆین و، بە چاوی خۆمان ئەو کارە جۆراوجۆر و پڕ موعجیزاتەی پادشا ببینین کە لە شوێنانی تردا پێش‌چاوی خستوون، چونکە ئەو شتە سەیرانەی کە ئێمە لەم پیشانگایە، یان لەم مەیدانە، یان لەم کۆشکەدا بینیمانن، لە هەموو شوێنێکی تردا نموونەیان هەیە، بەڵام شێوە و شکڵ و جۆری پێکهاتنیان لە یەکتر جیاوازە..

دەسا ئەی هاورێکەم! سەرنج لەمە بدە، تاکو:
مەودای دەرکەوتنی ڕێکوپێکیی: "دانایی" و..
ڕادەی ئاشکرایی ئاماژەکانی: "چاودێری" و..
ئەندازەی دەرکەوتنی نیشانەکانی: "دادگەری" و..
پلەی ئاشکرا بوونی بەروبوومەکانی: "میهرەبانی"ی فراوان.. لەو کۆشك و تەلارە ئاڵوگۆڕبوانە و، لەو مەیدانە فانی و، پیشانگا لەناوچوانەدا، ببینیت..

چونکە هەر کەسێك چاوی لەدەست نەدابێت، بەوپەڕی دڵنیاییەوە تێدەگات لەوەی کە نابێت، تەنانەت تەسەووریش ناکرێت: داناییەك لە دانایی پادشا کامڵتر و.. چاودێرییەك لە چاودێریی ئەو جوانتر و.. میهرەبانییەك لە هی ئەو فراوانتر و.. دادگەرییەك لەوەی ئەو مەزنتر هەبێت..

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم وڵاتە – وەك لە بەرچاودایە – دەرخستن و ئاشکرا کردنی ڕاستییەکانی ئەم: دانایی و، چاودێری و، میهرەبانی و، دادگەرییەی لە توانادا نییە.. ئەمە لە لایەکەوە.. لە لایەکی تریشەوە گەر – وەك تۆ گومان دەبەیت – پادشا لە مەڵبەندی پادشایەتیی وڵاتەکەیدا چەندین کۆشك و تەلاری هەمیشەیی و، جێ و شوێنی بەرز و نەگۆڕ و، خانە و لانەی خۆشی هەتاهەتایی و، هاووڵاتیی نیشتەجێبوو و، میللەت و ڕەعیەتی بەختیاری نەبێت کە ئەو: دانایی و، چاودێری و، میهرەبانی و، دادگەرییەیان بە تەواوی تێدا

بێته‌دی.. ئه‌وا ده‌بێ ئینكاریی ئه‌و "دانایی" و "چاودێری"و "میهره‌بانی"یه بكه‌ین كه به چاوی خۆمان ده‌یانبینین و، سه‌رپێچی له‌و هه‌موو نیشانه و ئاماژانه بكه‌ین كه به ئاشكرا "دادگه‌ری"یه‌كه‌ی پێش‌چاو ده‌خه‌ن. ئه‌و كاته‌ش ده‌بێ به‌وپه‌ڕی بێ‌عه‌قڵی و چه‌شنی نه‌فامیی ئه‌و كه‌سه‌ی كه به چاوی خۆی تیشكی خۆری ناوجه‌رگه‌ی ئاسمان ده‌بینێت كه‌چی ئینكاریی ده‌كات، ئێمه‌ش به‌و چه‌شنه ئینكاریی ئه‌و ڕاستی‌یانه بكه‌ین و - خوا نه‌خواسته - بڵێین: ئه‌و هه‌ڵسوكه‌وتانه‌ی كه به "دانایی" ئه‌نجام ده‌درێن و، ئه‌و كاروبارانه‌ی كه دارای چه‌ندین ئامانج و مه‌به‌ستی به‌نرخ و چاكه‌ی پڕ له "میهره‌بانی"ن، تێكڕا بریتین له: گاڵته‌جاڕی و غه‌در و بێ‌مه‌به‌ستی. خۆ دیاره ئه‌م ئه‌نجامه‌ش داخوازی ئه‌وه‌یه كه: "ڕاستی‌یه‌كان هه‌ڵبگه‌ڕێنه‌وه و ببن به شتی دژ و پێچه‌وانه‌ی خۆیان"! كه ئه‌مه‌ش مه‌حاڵێكه هه‌موو ژیران و خاوه‌ن بیرانی ساغ له‌سه‌ر مه‌حاڵی‌یه‌كه‌ی یه‌كیان گرتووه، مه‌گه‌ر مرۆڤی "سۆفستائی"ی گێژ و ده‌به‌نگ كه ئینكاریی بوونی هه‌موو شتێك، ته‌نانه‌ت بوونی خۆیشی، ده‌كات.

كه‌واته، جگه له‌م خانه و لانانه‌ی ئێره، چه‌ندین خانه و لانه‌ی تر و.. دادگایه‌كی مه‌زنتر و.. خانه‌یه‌كی دادگه‌ریی به‌رز و.. مه‌ڵبه‌ندێكی گه‌وره‌ی به‌خشنده‌یی هه‌یه بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌م میهره‌بانی و، دانایی و، چاودێری و، دادگه‌ری‌یانه به ڕوونی له‌وێ‌دا ده‌ربكه‌ون و ئاشكرا ببن.

❑ وێنه‌ی دوازده‌هه‌م:

وه‌ره با ئێستا له‌م گه‌شته‌مان بگه‌ڕێینه‌وه و له ڕێگاماندا به ئه‌فسه‌ر و سه‌ركرده‌كانی ئه‌م پێڕ و كۆمه‌ڵانه بگه‌ین..

فه‌رموو ته‌ماشای كه‌ره‌سه جه‌نگی‌یه‌كانیان بكه و، بیربكه‌ره‌وه و بزانه ئایا ئه‌م كه‌ره‌سانه‌یان ته‌نها بۆ ماوه‌یه‌كی كه‌م و بۆ ئه‌م مه‌یدانی مه‌شقه دراوه‌تێ؟ یان بۆ ئه‌وه‌ی ژیانێكی پڕ له به‌خته‌وه‌ریی له جێ‌یه‌كی تردا پێ به‌رنه سه‌ر؟

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئێمه ناتوانین یه‌ك‌به‌یه‌كی ئه‌و ئه‌فسه‌ر و سه‌ركردانه ببینین و چاومان به گشت كه‌ره‌سه و شمه‌ك و پێداویستی‌یه‌كانیان بكه‌وێت، ئه‌وا - بۆ نموونه - هه‌وڵ ده‌ده‌ین ته‌نها سه‌یری "پێناس" و "تۆماری كارنامه"ی یه‌كێكیان بكه‌ین، ئه‌وه‌تا ده‌بینین كه: پله و، مووچه و، ئه‌رك و، ئیمتیازات و، بواری كاری ئه‌فسه‌ره‌كه و، هه‌ر شتێك په‌یوه‌ندیی پێوه بێت، له پێناسه‌كه‌ی‌دا تۆمار كراوه..

بڕوانه! ئه‌م پله‌یه هی چه‌ند ڕۆژێكی كه‌م نی‌یه.. به‌ڵكو بۆ ماوه‌یه‌كی گه‌لێ درێژخایه‌نه..

لە پێناسەکەیدا نووسراوە کە: ئەم ئەفسەرە لە فلانە بەرواردا مووچەکەی خۆی لە گەنجینەی تایبەت وەردەگرێت.. بەڵام خۆ ئەم بەروارە گەلێ دوورە، دوای کۆتایی هاتنی ماوەی مەشق کردنی ناو ئەم مەیدانە نەبێت، ئەو بەروارە نایەتە پێش!

ئنجا فەرمانبەرییەکەشی هەرگیز شیاوی ئەم مەیدانە کاتی و کەم خایەنە نییە و لەگەڵ ماوەی ئەم مانەوە سەرپێییەدا ناگونجێت.. بەڵکو بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی بەختەوەرییەکی هەمیشەییە لە شوێنێکی بڵندی لای پادشای مەزنی بەتوانا خۆیدا..

پاشان هەرگیز ناشگونجێ ئەو کار و ئەرکانەی کە پێی سپێرراون تەنها لە پێناوی بەسەربردنی چەند ڕۆژێکی کەمی ناو ئەم میوانخانە سەرپێیی و کاتییەدا بێت.. بەڵکو بۆ ژیانێکی تری پڕ لە بەختیاریی هەمیشەیین..

کەواتە لەم "پێناسە"وە دەردەکەوێت کە: خاوەنەکەی بۆ شوێنێکی تر ئامادە کراوە، تەنانەت بۆ جیهانێکی تری جگە لەمە هەوڵ دەدات و دەڕوات و تێدەکۆشێت.

پاشان بۆ ئەم "تۆمارانە" بڕوانە کە چۆنێتی و بەرپرسیاریی بەکارهێنانی کەرەسەکانیان تێدا نووسراوە..

جا ئەگەر جگە لەم مەیدانە، پلەوپایەیەکی تری بەرز و بڵند و هەمیشەیی لە ئارادا نەبێت، ئەوا هیچ واتا و ناوەڕۆکێك بۆ ئەم "پێناسە" پڕ لە وردەکاری و "تۆمارە" ڕێك و پێکانە نامێنێتەوە و، پلە و پایەی ئەو ئەفسەر و پێشەوا و سەرکردە بەڕێزانە لە جێی خۆیاندا دەلەقێن و، بەرەو ئاستێکی گەلێ نزم شۆڕ دەبنەوە و دادەبەزن و، دووچاری بەدبەختی و زەلیلی و سووکی و ڕسوایی و گیرۆدەیی و لاوازی و هەژاری و شتانی وەك ئەمانە دەبن!

کەواتە گەر بە وردی ڕوانین و سەرنجی خۆت بۆ هەر لایەك ئاراستە بکەیت، ئەوا گشت سەرنجدان و ڕوانینەکانت بەرەو ئەم ئەنجامەت دەبەن کە:

(دوای ئەم "نەمان"ەی ئێستا "مانەوە"یەك هەیە).

دەسا ئەی هاوڕێکەم! ئەم وڵاتە – لە ڕاستیدا – وەك کێڵگە و، مەیدانێکی مەشق و فێر کردن و، بازاڕێکی بازرگانی وایە و، هەر دەبێ لە پاشاندا دادگایەکی گەورە و بەختیارییەکی مەزنی بە دوادا بێت.

خۆ ئەگەر ئینکاریی ئەم ئەنجامە بکەیت، ئەوا ناچار دەبێت ئینکاریی گشت پێناس و تۆمارەکانی ئەفسەرەکان و، ئەو هەموو کەرەسە و تفاق و تەعلیماتانە و، تەنانەت ئینکاریی هەموو یاسا و ڕێساکانی ئەم وڵاتە و، بەڵکو ئینکاریی خودی دەوڵەتیش بکەیت و، دەبێ ئەو هەموو ڕووداوانە بە درۆ بخەیتەوە کە لێرەدا ڕوو دەدەن. خۆ دیارە گەر ئەو هەموو

ئینكاری‌یانه‌ ده‌رببڕیت، ئه‌وا هه‌رگیز ناكرێ پێت بوترێت مرۆڤێكی ژیری خاوه‌ن هه‌ست و نه‌ست و شعوور، به‌ڵكو له‌ سۆفستائی‌یه‌كان گه‌لێ به‌ گه‌وج و نه‌فامتر له‌ قه‌ڵه‌م ده‌درێیت!

هه‌رگیز وا گومان نه‌به‌یت كه‌ به‌ڵگه‌ و ئاماژه‌كانی گۆڕینی ئه‌م وڵاته‌ ته‌نها له‌و "دوازده‌ وێنه‌"یه‌دان كه‌ ئێمه‌ هێنامانن. نه‌خێر، چونكه‌ نیشانه‌ و به‌ڵگه‌ی تابلێی زۆر و له‌ژماره‌به‌ده‌ر هه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌م وڵاته‌ فانی و پڕ له‌ ئاڵوگۆڕه‌، له‌ دوایی‌دا ده‌گۆڕێت و ده‌بێ به‌: وڵاتێكی تری دامه‌زراوی له‌ناونه‌چوو..

ئنجا گه‌لێ نیشانه‌ و ئاماژه‌ی زۆر و زه‌به‌نده‌ش هه‌ن كه‌ تێكرا به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی: ئه‌م هه‌موو خه‌ڵكه‌ له‌م میوانخانه‌ كاتی و فانی‌یه‌وه‌ به‌ره‌و باره‌گای هه‌میشه‌یی و به‌رده‌وامی پادشای مه‌زن ده‌گوێزرێنه‌وه‌.

وه‌ره‌ - ئه‌ی هاوڕێ‌كه‌م! - با به‌ڵگه‌یه‌كی گه‌لێ ڕوون و به‌هێزترت له‌و دوازده‌ به‌ڵگه‌یه‌ی وێنه‌كانی پێشوو بۆ ڕوون بكه‌مه‌وه‌.. وه‌ره‌ ته‌ماشایه‌كی ئه‌و نوێنه‌ره‌ به‌ڕێزه‌ خاوه‌ن مه‌دالیا به‌نرخ و به‌رزانه‌ بكه‌ كه‌ پێشتر له‌ دوورگه‌كه‌دا چاومان پێ‌كه‌وت. ئه‌وه‌تا ئه‌و نوێنه‌ره‌ به‌ڕێزه‌ فه‌رمانێك به‌و حه‌شاماته‌ جه‌م‌بووه‌ ڕاده‌گه‌یه‌نێت كه‌ له‌ دووره‌وه‌ لێمانه‌وه‌ دیارن. ده‌با بڕۆین گوێی لێ بگرین.. وریابه‌! وا گه‌یشتین، ئه‌وه‌تا نوێنه‌ری به‌ڕێز فه‌رمانه‌ به‌رزه‌كه‌ی پادشا بۆ حه‌شاماته‌ جه‌م‌بووه‌كه‌ ڕوون ده‌كاته‌وه‌ و، پێیان ده‌ڵێت:

(خۆتان ئاماده‌ كه‌ن، وا به‌ره‌و وڵاتێكی تری هه‌میشه‌یی و تابلێی مه‌زن و قه‌شه‌نگی وا كۆچ ده‌كه‌ین كه‌ ئه‌م وڵاته‌ی ئێره‌مان له‌ چاوی‌دا وه‌ك به‌ندیخانه‌یه‌ك وایه‌. جا ئه‌گه‌ر ئێوه‌ به‌ وردی گوێتان له‌م فه‌رمانه‌ی پادشای مه‌زن ڕاگرت و به‌ باشی جێ‌به‌جێ‌تان كرد، ئه‌وا له‌و باره‌گایه‌ی پادشادا كه‌ كۆچی بۆلا ده‌كه‌ن شایانی میهره‌بانی و شایسته‌ی چاكه‌كاریی پادشا ده‌بن. ده‌نا له‌ ئه‌نجامی سه‌رپێچی كردنتان له‌م فه‌رمانه‌ و بایه‌خ نه‌دانتان پێی، له‌ به‌ندیخانه‌ و زیندانه‌ سامناكه‌كاندا توند ده‌كرێن و پشت‌گوێ ده‌خرێن).

ئه‌وه‌تا ئه‌م فه‌رمانه‌ یادی ئاماده‌بوان ده‌خاته‌وه‌ و، به‌ چاوی خۆیشت مۆری لاسایی نه‌كراوه‌ی پادشا به‌سه‌ر ئه‌و فه‌رمانه‌وه‌ ده‌بینیت. سه‌رجه‌می ئاماده‌بوانیش - جگه‌ له‌ كه‌سانی كوێر و كاسی وه‌كو تۆ - هه‌ر ته‌نها به‌ سه‌یر كردنێكی ئه‌و مه‌دالیایانه‌ ده‌زانن ئه‌و نێرراوه‌ی كه‌ ئه‌م هه‌موو مه‌دالیایانه‌ی خه‌ڵات كراوه‌ ڕاگه‌یه‌نه‌رێكی ئه‌مینی فه‌رمانه‌كانی پادشایه‌.

جا ئایا ئیتر ده‌گونجێ مه‌سه‌له‌ی گۆڕانی ئه‌م وڵاته‌ فانی‌یه‌ به‌و وڵاته‌ هه‌میشه‌یی‌یه‌ی كه‌ ئه‌و نوێنه‌ره‌ به‌ڕێزه‌ به‌ هه‌موو هێز و توانایه‌كیه‌وه‌ ڕوونی‌ده‌كاته‌وه‌ و پشتی‌ده‌گرێت و، ئه‌و فه‌رمانه‌

بەڕێز و بەرزە پادشایی‌یەش کە لێی دەدوێت، هیچ گومان و دوودڵی و ڕەخنەیەك توخنی بکەوێت؟

دیارە نەخێر.. هەرگیز شتی وا ناگونجێ و ناکرێت، مەگەر ئینکاریی ئەو هەموو کاروبار و ڕووداوانە بکەیت کە بە چاوی خۆت لێرەدا دەیانبینیت.

ئێستاش ئەی کاکی هاوڕێم! دوای ئەم ڕوونکردنەوانە، چ قسەیەکت هەیە، فەرموو بیکە و دەری ببڕە.

هاوڕێکەی وەڵامی دایەوە:

– ئایا ئیتر دوای ئەم ڕوونکردنەوانە من چی بڵێم؟ بۆچی لە بەرامبەر ئەم ڕاستی‌یانەوە بواری قسە و باس بۆ هیچ قسەکەرێك ماوەتەوە تا قسەی تێدا بکات؟ یان ئایا بە خۆری ناوجەرگەی ئاسمان دەوترێت: کوا خۆر؟ لە کوێ‌یە؟! دیارە نەخێر.. بەڵام دەمەوێت تەنها ئەوەندە بڵێم کە: هەزارویەك شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورەی پەروەردگار کە لە چنگی وەهم و گومان ڕزگاری کردم و، لە دیلیی نەفس و بەندیخانەی هەمیشەیی دەرباز بووم و، باوەڕم هێنا کە خانەیەکی بەختەوەری لە حوزووری پادشای مەزندا بۆ ئێمە ئامادە کراوە، تاکو دوای ئەم خانە فانی و شپرز و شلۆق و شێواوەی ئێرە کۆچی بۆلا بکەین.

بەم جۆرە، ئەم چیرۆکەی کە "کینایە" و هێمایەك بوو بۆ حەشر و قیامەت، لێرەدا دوایی هات و، لەمەولا بە پەنا و پشتیوانیی خوای گەورەی بەتوانا بەرەو ڕاستی‌یە مەزن و بەرزەکان دەڕۆین و دەگوێزینەوە و، بەرامبەر بەو دوازدە وێنەیەی پێشوو "دوازدە ڕاستی"ی ڕوونی ئەوتۆ باس دەکەین کە پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵیان لە نێواندایە، دوای ئەوەی کە بە نووسینی "پێشەکی"یەك ڕێ بۆ باسکردنی ئەو ڕاستی‌یانە خۆش دەکەین.

* * *

# پێشەکی

**تەنها چەند ئاماژەیەك بۆ هەندێ لەو مەسەلە و باسانە دەکەین کە لە چەندین جێی تردا (واتە لە: وتەی بیست و دووهەم و نۆزدەهەم و بیست و شەشەمدا) ڕوون کراونەتەوە.**

◆ **ئاماژەی یەکەم:**

سێ "ڕاستی" هەن، کە ئێمە لە چیرۆکەکەدا بە: "مرۆڤە گەلحۆکە" و "هاوڕێ دڵسۆز و ئامۆژگارەکەی" پێش‌چاومان خستن:

یەکەمیان: دەروونی بەدخوازم و.. دڵی خۆمە..

دووهەمیان: زانایانی فەلسەفە و.. قوتابییانی قورئانی پیرۆزن..

سێ‌هەمیان: میللەتی کوفر و.. نەتەوەی ئیسلامە..

تەنها "نەناسینی خوای گەورە"یە کە زانیارانی فەلسەفە و.. میللەتی کوفر و.. دەروونی بەدخوازیان هاویشتە ناو گومڕایی سامناك و ترسناکەوە، چونکە هەروەك لە چیرۆکەکەدا ئامۆژگارە دڵسۆزەکە بە هاوڕێکەی خۆی وت: "هەرگیز ناکرێ پیتی بێ نووسەر و یاسای بێ حاکم هەبێت"، ئێمەش دەڵێین: بەڵێ، کتێبی بێ نووسەر شتێکی گەلێ مەحاڵە، بە تایبەت کتێبێکی وەك ئەمەی کە یەك بە یەکی وشەکانی کتێبێکی تری بە خەتێکی ورد و، لە ژێر هەموو یەکێ لە پیتەکانی‌دا پارچەیەك هۆنراوەی بە قەڵەمێکی باریك تێدا نووسرابێتەوە..

جا هەروەك نەبوونی نووسەر بۆ کتێبی ئاوەها کارێکی مەحاڵە، بە هەمان جۆر و لە هەموو مەحاڵێ مەحاڵتریش ئەوەیە کە ئەم گەردوونە داهێنەرێکی نەبێت بەدیی‌هێنابێت، چونکە ئەم گەردوونە -لە ڕاستی‌دا- کتێبێکی ئەوەندە مەزنە کە هەموو لاپەڕەیەکی چەندەها کتێبی تێدایە، تەنانەت هەموو وشەیەکی کتێبێکە بۆ خۆی و، هەموو پیتێکیشی پارچەیەك هۆنراوەیە.. ئەوەتا هەر تەنها ڕووی زەوی لاپەڕەیەکە لەم کتێبە و بزانە چەندە کتێبی زۆری تێدایە!.. درەخت وشەیەکە، بڕوانە چەندە لاپەڕەی زۆر و زەبەندەی تێدا ڕیز کراوە!.. بەری درەخت پیتە و.. تۆوەکەیشی نوختەیە! لەم نوختەیەدا پێڕست و بەرنامەی کاری درەختێکی زەبەلاح بە ڕێکوپێکی دانراوە!

جا کتێبێـك کـە ئـاوا بێـت، ئەگـەر داهێنـانی قەڵـەمی یـەکێکی خـاوەن توانسـت و دارای سیفەتی جوانـی و شـکۆمەندی و دانـایی ڕەهـا نـەبێت، هــەرگیز نـاکرێ بــە هیــچ کەسـێك بنووسرێت.

واتە: تەنها سەیر کردن و تێڕوانینێکی ئـەم جیهانـە، داخـوازی ئـەم ئیمانـە دەبێـت. مەگـەر کەسێك "گومڕایی" مەستی کردبێت!

هـەروەها وەك ناگونجێ خـانووی بێ وەستا هـەبێت. بـە تایبـەت ئـەم خانەیـەی کـە بـە ناوازەترین ئارایش و، بە قەشەنگترین و سەرسووڕهێنترین نەخش و نیگار ڕازێنراوەتەوە و، بـە تەرزێکی بێ وێنە بنیات نراوە، بە ڕادەیەك کە هەموو یەکێ لە بەردەکانی ئەم خانەیـە هونـەری بنیاتنانی هەموو کۆشکەکەی تێدا بەرجەستە بووە.. خانەی ئـاوا، هیـچ ژیرێـك بـاوەڕ ناکـات کە بێ وەستایەکی کارامە دروست کرابێت.. وەستایەك کە هەر بە تایبەت لەم دیوانـەدا و لـە هەموو کاتژمێرێکدا چەندین خـانە و لانەی ڕاستەقینە - بەوپەڕی ڕێکوپێکی - بنیات دەنێت و ئنجـا بەوپـەڕی ئاسـانیی چەشـنی ئاسـانیی گۆڕینـی بـەرگ و پۆشـاك بـە ڕێکـی ئاڵوگۆڕیـان بەسەردا دەهێنێت، بگرە لە هـەموو سـووچ و گۆشـەیەکدا و بـە دیمـەنێکی ڕاستەقینە چـەندین ژووری بچووك بنیات دەنێت و دروستیان دەکات..

کەواتە ئەم گەردوونە مەزنەش دەبێ بەدیهێنەرێکی دانای زانـای خـاوەن توانسـتی ڕەهـای بێت، چونکە گەردوون وەك کۆشکێکی ناوازە وایە، مانگ و ڕۆژ و ئەسـتێرەکان گڵـۆپ و چرا و مۆمی ئـەو کۆشـکەن و، "کـات"یـش تەنافێکـە هـەموو سـاڵێك بەدیهێنـەری شـکۆمەند جیهانێکی تـری نوێـی پێدا هەڵدەواسێت و بوونـی پێ دەبەخشـێت و، بـەم کـارەش چـەندین وێنەی ڕێکوپێـك و قەشـەنگ لـە سێ سـەد و شەسـت شـکڵ و شێوەدا نـوێ دەکاتـەوە و، بە ڕێکوپێکی و بـە دانایی‌یـەکی تـابلێی تـەواو ئاڵوگۆڕیـان بەسـەردا دەهێنێـت و، ڕووی زەویـی کردووە بە سفرەیەکی ئەوتۆ کە هــەموو بـەهارێك بـە سێ سـەد هـەزار جـۆری بەدیـهێنراوانی خۆی دەیڕازێنێتەوە و، بـە نیعمەتـە لەژمارەبەدەرەکانیشـی پـڕی دەکـات. ئنجـا هەرچـەند ئـەو نیعمەتانەش زۆر تێکەڵ و پێکهەڵپڕژاو و تێك ئاڵاون، کەچی هەر تەنها ئەو، یەك بە یەکیان بـە تەواوی لە یەکتر جیا دەکاتەوە..

ئیتر بۆ خۆت سەرجەمی شتانی تری ناو گەردوون وەك ئەمانەی بـاس کـران و بـەم چەشـنە پێوانە و بیر کردنەوەیە لێك بدەرەوە.

باشە ئایا چۆن دەکرێ مرۆڤ خۆی لە بنیاتنەری چەشنی ئەم کۆشکە ناوازەیە گێـل و بێ ئاگا بکات؟!

ئنجا دەبێ ئەو کەسە چەندە گێل و گەلحۆ بێت کە لە ڕۆژێکی سـامالّدا ئینکـاریی خـۆری ناوجەرگـەی ئاسمــان بکــات! لــە کــاتێکدا کــە بریسـکانەوەی تیشـکەکانی ئــەو خــۆرە و

شکانەوەی ڕووناکی‌یەکەی بەسەر هەموو کەف و گلۆپ و بلقەکانی دەریاوە و بە گشت مادده بریسکەدارەکانی سەر زەوی و تەنانەت کلووی بەفرەکانیشەوە، هەموو کەسێ بە چاو دەیبینێت؟! چونکە ئینکاری کردنی ئەو تاکە خۆرەی ناوجەرگەی ئاسمان لە کاتێکی ئاوادا، داخوازی ئەوە دەبێت کە مرۆڤ باوەڕ بە بوونی ئەوەندە وردیلە خۆری ڕاستەقینە بکات کە بە ئەندازەی ژمارەی ئەو دڵۆپ و کەف و بلقانەی دەریا و ژمارەی ئەو کلووە بەفرانە بێن!

جا هەروەك باوەڕ کردن بە بوونی خۆرێکی مەزن لە یەك بە یەکی ئەو وردیلانەدا - کە هەریەکەیان بە ئەندازەی گەردیلەیەك دەبن- بە گێژی و گەلحۆیی دادەنرێت، بە هەمان جۆریش باوەڕ نەهێنان بە بەدیهێنەری شکۆمەند و تەسدیق نەکردنی وەسفەکانی کەماڵی ئەو بەدیهێنەرە، لەگەڵ بینینی ئەم بوونەوەرە ڕێکوپێکانەی کە وا هەموو دەم و ساتێك بە دانایی دەگۆڕڕێن و یەك لە دوای یەك دێن و هەمیشە بە ڕێکوپێکی نوێ دەکرێنەوە، بێ هیچ گومانێ، وڕێنە و شێتی‌یە.. چونکە ئەو چەشنە هەڵوێستە داخوازی ئەوە دەبێت کە باوەڕ بە بوونی خوایەتی‌یەکی ڕەها لە هەموو شتێکدا، تەنانەت لە هەموو گەردیلەیەکدا، بکرێت!

ئەوەتا - بۆ نموونە - هەموو گەردیلەیەکی "هەوا" دەتوانێت بڕواتە ناو گشت گوڵ و، بەر و، گەڵایەك و، لەوێدا کارەکانی خۆی ڕابپەڕێنێت. جا ئەگەر ئەم گەردیلە "هەوا"یە کە ئەم هەموو کارانە جێبەجێ دەکات، لە لایەن یەکێکەوە کە نەخشەی ئەو کارانەی بۆ دەستنیشان بکات کار پێسپێرراو نەبێت، دەبێ زانا و شارەزای شکڵ و شێوە و وێنە و پێکهاتنی یەك بە یەکی ئەو شتانە بێت کە دەڕواتە ناویانەوە. واتە: دەبێ دارای زانیاری‌یەکی گشتگیر(محیط) و خاوەنی توانستێکی گشتیی هەمەلایەنگیر بێت تاکو بتوانێت ئەو کارانەی ڕابپەڕێنێت!!

هەروەها - بۆ نموونە - دەکرێ یەك بە یەکی گەردیلەکانی "خاك" ببن بەهۆی سەوزبوون و نەشونما و گەشە کردنی هەموو تۆوە جۆراوجۆر و جیا جیاکانی سەر ڕووی زەوی. جا ئەگەر ئەو گەردیلەیە کار پێسپێرراو و ڕامکراوی یەکێك نەبێت کە ئەو کارانەی پێ ئەنجام بدات، دەبێ بە ئەندازەی ژمارەی هەموو گژ و گیا و درەختەکانی سەر زەوی، ئامێر و ئامرازی مەعنەویی جۆراوجۆر لە یەك بە یەکی ئەو گەردیلانەدا دانرابن.. یاخود دەبێ "توانا" و "کارامەیی"یەکی لەڕادەبەدەری ئەوتۆ بەو گەردیلانە بدرێت کە هەموو شکڵ و شێوەکانی پێکهاتنی ئەو ڕووەکانەیان پێ بزانێت کە دەچێتە ناویانەوە، تاکو بتوانێت بۆ خۆی دروستیان بکات و، ئاگاداری گشت وێنەکانیشیان بێت بۆ ئەوەی بەو تان و پۆیەی لە بەرچاودایە بیانچنێت!

ئیتر بۆ خۆت هەموو بوونەوەرانی تر بە چەشنی ئەم دوو نموونەیە لێك بدەرەوە، تاكو تێبگەیت كە مەسەلەی "وەحدانییەت"(واتە: بوونی خوایەكی بەدیهێنەری تاكی تەنیا) مەسەلەیەكە لە هەموو شتێكدا چەندەها بەڵگەی ڕوون و ئاشكرای لەسەر هەیە.

بەڵێ، بەدیهێنانی هەموو شتێك لە یەك دانە شت و، بەدیهێنانی یەك دانە شتیش لە هەموو شتێك، كارێكە تایبەتە تەنها بە بەدیهێنەری هەموو شتێكەوە! فەرموو سەرنج بدە و بیر لەم فەرمایشتەی خوای گەورە بكەرەوە كە دەفەرموێ: ﴿ وإن مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسبِّحُ بحمده ﴾ ئنجا تێبگە و بزانە كە باوەڕنەهێنان بە یەك خوای تاكی تەنیا، داخوازی باوەڕبوون دەبێت بە چەندەها خوای زۆر و زەبەندەی بە ئەندازەی ژمارەی بوونەوەران!

◆ **ئاماژەی دووهەم:**

لە چیرۆكەكەدا باسی نوێنەرێكی بەڕێز كرا و، وترا كە: هەركەسێك كوێر و نابینا نەبێت هەر تەنها لە بینینی مەدالیاكانیەوە تێدەگات ئەو نوێنەرە كەسێكی مەزنە و كارمەندی تایبەتیی پادشایە و، تەنها بە فەرمانی پادشا كارەكانی جێبەجێ دەكات. جا مەبەست لەو نوێنەرە بەڕێزەی ناو چیرۆكەكە پێغەمبەری مەزنمانە ﷺ .

بەڵێ، بە چەشنی پێویستیی بوونی "ڕووناكی" بۆ "خۆر"، بوونی نوێنەرێكی ئاوا بەڕێزیش بۆ گەردوونێكی ئاوا ناوازە و بۆ بەدیهێنەرە پاك و خاوێنەكەی، كارێكی پێویستە. چونكە هەروەك ناگونجێ خۆر تیشكی ڕووناكی نەبەخشێت، بە هەمان جۆریش ناگونجێ ئەو "خوایەتی"یە لە ڕێی ناردنی "پێغەمبەرە بەڕێزەكانەوە" - درووودیان لەسەر بێت - خۆی نەناسێنێت و ئاشكرای نەكات.

چونكە ئایا دەگونجێ جوانییەك كە لەوپەڕی كەمالدا بێت حەز نەكات - لە ڕێی هۆكارێكەوە - خۆی بناسێنێت و دەری بخات؟

یان ئایا دەگونجێ كەمالێك لەوپەڕی جوانیدا بێت، داواكاری ئەوە نەبێت كە بە بۆنەی هۆیەكەوە خۆی ئاشكرا بكات و ڕوانینی سەرنجدەران بۆ لای خۆی ڕابكێشێت؟

یان ئایا دەگونجێ "دەستەلاتدارییەكی هەمەكی"ی "پەروەردگارێتییەكی گشتی و هەمە لایەنە" داخوازی ئەوە نەبێت كە یەكتایی و صەمەدانییەتی خۆی بۆ هەموو چینە جیاجیاكان ئاشكرا بكات لە ڕێی نوێنەرێكی ئەوتۆوە كە دارای دوو باڵ واتە دوو سیفەت بێ: سیفەتی بەندایەتیی هەمەكی (چونكە نوێنەری گشت چینەكانی بەدیهێنراوانە لە خزمەت پەروەردگاردا) و، سیفەتی پێغەمبەرایەتی و نزیكی لە خوای گەورە (چونكە لە لایەن خوای گەورەوە بۆ هەموو جیهانەكان بە گشتی ڕەوانە كراوە)؟

یان ئایا دەگونجێ یەكێك كە خاوەنی "جوانیی خۆیی و ڕەها" بێت، نەیەوێت لایەنە ناسكۆڵە و قەشەنگەكانی جوانیی خۆی لە چەند ئاوێنەیەكی وێنەدەرەوەی ئەو جوانییەیدا

بینێت و پیشانی بەدیهێنراوەکانی خۆیشی بدات؟ واتە نەیەوێت لە ڕێی نێرراوێکی خۆشەویستەوە ئاشکرای بکات؟ ئەو نێرراوەی کە لە لایەکەوە خۆشەویستیەتی، چونکە بە بەندایەتیی بێ گەرد و خاوێن خۆی لای خوای گەورە خۆشەویست کردووە و.. لە لایەکی تریشەوە پێغەمبەر و ڕەوانەکراوە، چونکە لە ڕێی دەرخستنی جوانیی ناوە جوانەکانی خوای گەورەوە، ئەو خواوەندە لای بەدیهێنراوانی خۆشەویست دەکات؟

یان ئایا دەگونجێ بۆ کەسێك کە دارای چەندین گەنجینەی پڕ لە بەنرخترین و سەرسووڕهێنەرترین گەوهەری نایابی ئەوتۆ بێت کە ژیریی تێدا سەرسام ببێت، نەیەوێ کەماڵە پەنهانەکەی خۆی ئاشکرا بکات و داواکاری پێش‌چاو خستنی نەبێ لە بەرچاوی تێکڕای بەدیهێنراواندا لە ڕێی هۆیەکی ناسێنەری کارامە و جاڕدەر و ئاشکرا کەرێکی لێزان و وریا؟

یان ئایا دەگونجێ بۆ ئەو کەسەی وا ئەم گەردوونەی بە چەندین بەدیهێنراوی ئەوتۆ ڕازاندووەتەوە کە کەماڵی ناوە جوانەکانی ئەو دەردەخەن و دەری دەبڕن و، گەردوونی کردووە بە کۆشکێکی قەشەنگی ڕەنگین و بە شتانی ناوازە و سەرسووڕهێنی سنعەتی خۆی ئارایشتی داوە و لە پێش‌چاواندا دەری خستووە.. ئەو کەسە، ئەرکی ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی ئەم گەردوونە بە ڕابەر و مامۆستایەکی پێشەوا نەسپێرێت؟

یان ئایا دەگونجێ خاوەنی ئەم گەردوونە - لە ڕێی نێرراوێکەوە - مەبەستی خۆی لەم ئاڵوگۆڕانەی گەردوون و ئامانجەکانی لەم نهێنی‌یە داخراوەدا ڕوون نەکاتەوە و، هەر بەهۆی ئەو نێرراوەیەوە وەڵامی مەتەڵی ئەو سێ پرسیارە سەختەی بوونەوەران نەداتەوە کە بریتین لە: "تۆ کێیت؟.. لە کوێوە هاتوویت؟.. بۆ کوێ دەڕۆیت"؟!

یان ئایا دەگونجێ ئەو بەدیهێنەرە شکۆمەندەی کە بەم بەدیهێنراوە جوان و ڕەنگینانەی وان لە بەرچاودا خۆی بە خاوەن هەستان ناساندووە و بە بەخشینی نیعمەتە بەنرخەکانیشی خۆی لە لا خۆشەویست کردوون.. ئەم بەدیهێنەرە شکۆمەندە، بەهۆی نێرراوێکی خۆیەوە، ئەو شتانەی کە مایەی "ڕەزامەندیی خۆی"ن و، ئنجا داواکاری‌یەکانی لە بەرامبەر ئەو نیعمەتانەی کە بەخشیونی، بۆ بەدیهێنراوانی خۆی ڕوون نەکاتەوە؟

یان ئایا دەگونجێ ئەو بەدیهێنەرەی کە جیاوازیی هەست و شعوور و بۆچوونی لە گرۆی مرۆڤدا داناوە و، توانا و لێهاتنی مرۆڤی بۆ بەندایەتی‌یەکی هەمەکی ئامادە کردووە، لە ڕێی ڕابەرێکی نێرراوی خۆیەوە، سەرنجی ئەو هەموو زۆر و زەبەندەیی‌یەی هەست و بۆچوونەکانی ناو گرۆی مرۆڤ بۆ لای: "تەوحید" ڕانەکێشێت؟

بەم پێیە و، جگە لەمانەش کە باس کران، چەندین بەڵگەی گومانبڕی تر هەن کە هەر هەموویان "ئەرك و فرمانی پێغەمبەرێتی" دەردەخەن و، ئەو ڕاستییە ڕوون دەکەنەوە کە هەرگیز "خوایەتی" بە بێ بوونی "پێغەمبەرێتی" نابێت و ناگونجێ.

ئێستاش سەرنج بدە و بیر بکەرەوە، بزانە ئایا لە هەموو جیهاندا جگە لە محەممەدی هاشمی ﷺ کەسێکی تر پەیدا بووە کە دارای توانا و لێهاتنێکی لە هەموان زیاتر بێت و ئەو سیفەت و ئەرکە ناوبراوانەی پێغەمبەرایەتیی تێدا جەم بووبێت؟ یان ئایا کەسێك هەیە لەو شایستەتر بێت بۆ پلەی پێغەمبەرایەتی و ڕەوانەکراوی و ئەرکی ڕاگەیاندن؟ یان ئایا ڕۆژگار کەسێکی لەو مەزنتری دەرخستووە کە لەو شایانتری ئەو پلەیە بێت؟ دیارە نەخێر.. نەخێر.. چونکە هەر تەنها ئەوە کە پێشەوای گشت پێغەمبەران و بینایی چاوی هەموو مرۆڤە خاوێنەکان(الأصفیاء) و پادشای گشت ڕابەران و پوختە و کاکڵەی هەموو مرۆڤە هەڵبژاردە و نزیکەکانی دیوانی بەدیهێنەری میهرەبانە و، خاوەنی هەزاران موعجیزەی چەشنی: لەتکردنی مانگ و، هەڵقوڵانی ئاوە لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانیەوە، جگە لە نیشانە و بەڵگە لەژمارەبەدەرەکانی تری پێغەمبەرێتییەکەی کە تێکڕای ئەهلی فەزڵ و دانایی و زانست دانی پێدا دەنێن و قسەیان لەسەری یەکانگیر بووە و، جگە لە قورئانی پیرۆز کە دەریای حەقیقەتەکان و موعجیزەی هەرە مەزنی ئەو پێغەمبەرە بەرێزەیە ﷺ چونکە قورئانی پیرۆز چەشنی خۆری ڕۆشنا وایە، بەڵگەیەکی گومان نەهێڵە لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرایەتییەکەی.

ئێمە لە پەیامەکانی نووردا، بە تایبەت لە "وتەی بیست و پێنجەم"دا نزیکەی چل ڕووی ئیعجازی ئەو قورئانە پیرۆزەمان چەسپاندووە.

◆ **ئاماژەی سێهەم:**

با هەرگیز ئەوە بە دڵی کەسدا نەیەت کە بڵێت: بەها و گرنگیی ئەم مرۆڤە بچووکە چییە هەتا لە پێناوی لێپرسینەوەیدا لەسەر کردارەکانی، کۆتایی بەم دنیا مەزنە بهێنرێت و دەروازەی دنیایەکی تری نوێ بکرێتەوە؟

با ئەمە بە دڵدا نەیەت.. چونکە ئەم مرۆڤە هەرچەند بە ڕواڵەت تابڵێی بچووکە، بەڵام لە ڕاستیدا لەبەر ئەو سروشتە گشتی و هەمە لایەنەی کە تیایدایە، سەروەر و پێشەوای هەموو بوونەوەرانە و، بانگەوازکاری دەستەڵاتداریی خوایەتیی خوایە و، نوێنەر و پیشاندەری بەندایەتیی گشتی و هەمەلایەنەیە.. لەبەر هەموو ئەمانە، مرۆڤ دارای گرنگییەکی گەلێ مەزنە.

هەروەها ئەوەش بە دڵدا نەیەت کە: ئەم مرۆڤەی خاوەنی تەمەنێکی یەکجار کورت و کەم خایەنە، چۆن بە سزایەکی هەمیشەیی مەحکووم دەکرێت؟

یا ئەمەش بە دڵدا نەیەت.. چونکە "کافرێتی" تاوانێکی تابڵێی گەورەی بێ سنوورە، لەبەر ئەوەی بەها و بایەخ و پلەی بەرزی بوونەوەران -کە دارای بەها و پلەی: نووسراوی صەمەدانیی خواوەندن - دادەگرێت و دەیهاوێتە قووڵایی بێ مەبەستی و، وا دەباتە وەهمی مرۆڤەوە کە هیچ ئامانج و مەبەستێك لە دروستبوون و بەدیهاتنیاندا نەبێت.. "کافرێتی" سووك سەیر کردنی بوونەوەرانە و، ئینکاری کردنی ئەو نوورانەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەیە کە بە بوونەوەرانەوە دەدرەوشێنەوە و، سەرپێچی کردنە لە شوێنەوار و جێدەستەکانی ئەو ناوانەی خوای گەورە کە بەسەر ڕوخساری بوونەوەرانەوەن.. هەروەها "کافرێتی" بەدرۆخستنەوەی ئەو هەموو کۆمەڵە لەژمارەبەدەرانەی بەڵگەکانی ڕاستیی: "بوونی خواوەندی حەق و بێ گومانە"..

خۆ هەموو ئەمانەش تاوانی لە سنوور بەدەرن و، دیارە تاوانی لە سنوور بەدەریش داخوازی سزای لە سنوور بەدەر دەبێت؟

◆ **ئاماژەی چوارەم:**

لە چیرۆکەکەدا - بە هەر دوازدە وێنەکانیەوە - بینیمان کە:

هەرگیز ناگونجێ پادشایەکی یەکجار دەسەڵاتدار و تابڵێی مەزن مەملەکەتێکی تری هەمیشەیی و بەردەوامی نەبێت کە شایانی شان و شکۆ و مەزنی و پایەداریی دەسەڵاتی بەرزی ئەو بێت.

هەروەك ئەمە ناگونجێ.. بە هەمان جۆر ئەوەش هەرگیز ناگونجێ کە: بەدیهێنەری باقی و هەمیشەیی، لە دوای ئەم جیهانە فانی و لەناوچووە، جیهانێکی نەمر(باقی) و هەتاهەتایی بەدی نەهێنێت..

هەروەها هەرگیز ناگونجێ سنعەتکاری ئەزەلیی مەزن ئەم بوونەوەرە ناوازە و لەناوچوانە بەدی بهێنێت، بەڵام چەندین بوونەوەری تری بەردەوام و هەمیشەیی دروست نەکات..

هەروەها ناگونجێ بەدیهێنەری دانای بەتوانا و میهرەبان ئەم جیهانە بەدی بهێنێت کە وەك پیشانگایەکی گشتی و مەیدانێکی تاقیکردنەوە و کێڵگەیەکی کاتی وایە، پاشان ئەودنیا بەدی نەهێنێت، کە هەر ئەو دنیایە مەبەست و ئامانجەکانی ئەو دەردەخات و ئاشکرایان دەکات!

ئەم ڕاستی‌یە، لە "دوازدە دەرگا"وە مرۆڤ دەچێتە ناویەوە، ئەو دەرگایانەش بە "دوازدە ڕاستی" دەکرێنەوە.

وا ئێمەش بە ڕاستی‌یە هەرە کورت و ئاسانەکانیان دەست پێ دەکەین.

**ڕاستیی یەکەم**

دەرگای: "پەروەردگاری" و "دەستەڵاتداری"

کە درەوشانەوەی ناوی: "الربّ"ی خوای گەورەیە

ئایا دەگونجێ بۆ کەسێك کە خاوەنی پایەی "پەروەردگاری" و "دەستەڵاتداری"ی خوایەتی بێت و، بۆ چەندین ئامانجی بەرز و مەبەستی مەزن گەردوونێکی ئاوا ناوازەی وەك ئەمەی بەرچاومانی بەدی هێنابێت، تاکو بەم بەدیهێنانە کەماڵی خۆی ئاشکرا بکات و لە پێش‌چاواندا دەری بخات.. پاشان - ئەو کەسە - پاداشتێکی لە لا نەبێت بۆ ئەو ئیماندارانەی کە بە: "ئیمان" و "بەندایەتی" پێشوازی‌یان لەو ئامانج و مەبەستانەی ئەو کردووە و، سزای ئەو گومڕایانەش نەدات کە دەستیان بە ڕووی ئەو ئامانجانەوە ناوە و بە چاوی سووك و بایەخ پێ نەدانەوە بۆیان ڕوانیوە؟!

**ڕاستیی دووهەم**

دەرگای: "کەرەم" و "میهرەبانی"

کە درەوشانەوەی ناوی: "الکریم" و "الرحیم"ی خوای گەورەیە

ئایا دەگونجێ بۆ پەروەردگار و خاوەنی ئەم جیهانە، کە بە شوێنەوار و جێ دەستەکانی توانستی خۆی:

"کەرەم"ێکی نەبڕاوە و..

"میهرەبانی"یەکی بێ کۆتایی و..

"عیززەت"ێکی بێ پایان و..

"غیرەت"ێکی لە سنوور بەدەری دەرخستووە..

ئەم خواوەندە، پاداشتێك بۆ چاکەکاران دەستنیشان نەکات کە شایانی "کەرەم" و "میهرەبانی"یەکەی خۆی بێت و.. سزایەکیش بۆ خراپکاران بڕیار نەدات کە شیاوی ئەو "عیززەت" و "غیرەت"ەی ئەو بێت؟

چونکە ئەگەر مرۆڤ بە وردی بۆ ڕەوتی ڕووداوەکان بڕوانێت، دەبینێ هەموو بوونەوەرێك، هەر لە بچووکترین و کۆڵەوارترین زیندەوەرەوە[1] تا دەگاتە بەهێزترینیان، ڕۆزیی تایبەتیی خۆی لە هەموو لایەکەوە بۆ دێت و پێی دەگات، بگرە ئەو خواوەندە پەروەردگارە نیانترین و جوانترین ڕۆزی بە لاوازترین و دەستەوسانترین زیندەوەر دەبەخشێت و.. هەموو نەخۆشێکیش بەو دەرمانەی کە پێی چاك ببێتەوە، تیمار دەکات. بەم جۆرە، هەر کەسێ پێویستیی بە هەر شتێك ببێت، ئەو پێداویستی‌یەی بە چەشنێك بۆ دابین دەکرێت کە هەر لە حسابی خۆیشی‌دا نەبووە و بە خەیاڵی‌دا نەهاتووە.

جا ئەم میوانداری‌یە نایاب و، بەخشینە بەردەوام و، کەرەمە بەرزە، بە ئاشکرایی و ڕوونی، بەڵگەن و ڕێنماییمان دەکەن بۆ ئەوەی کە: دەستێکی هەمیشەیی و بەخشندە هەیە ئەم کارانە ئەنجام دەدات و ڕێکیان دەخات و دەیانسازێنێت.

بۆ نموونە: پۆشینی بالای گشت درەختەکان لە وەرزی بەهاردا بە چەندین پۆشاکی جوانی چەشنی ئاوریشمی سەوز بە ڕادەیەك کە دەڵێی حۆریی بەهەشتن و، ئارایشتدانیان بە چەندەها گوڵی ڕەنگین و بەروبوومی ناسك و، ڕامکردنیان بۆ خزمەتگوزاریی ئێمە، بەوەی کە ناسکترین و بەلەزەتترین میوە و بەروبوومان بۆ بەرهەم دەهێنن و لە کۆتایی لق و پەلەکانیاندا - کە وەك چەند دەستێکی نەرمونیان وان بۆ ئەو درەختانە - پێشکەشمانی دەکەن.. هەروەها بواردان بە ئێمە کە بتوانین لە مێروویەکی ژەهراوی بەهرەمەندی خواردنی هەنگوینێك ببین کە شیفا و چارەسەریی بیمارانمانی تێدایە و.. پۆشتە کردنمان بە جوانترین و نەرمترین پۆشاك لە بەرهەمی ڕستنی مێروویەکی بێ دەست و.. پاشەکەوت کردنی میهرەبانی‌یەکی مەزن بۆمان لەناو تۆوێکی یەکجار بچووکدا..

هەموو ئەمانە - بە ئاشکرا - "کەرەم"ێکمان لەوپەڕی جوانیی و، "میهرەبانی"یەکمان لەوپەڕی نەرمونیانی‌دا، پیشان دەدەن.

هەروەها هەوڵ و تەقالادانی گەورە و بچووکی زیندەوەران - جگە لە مرۆڤ و هەندێ لە ئاژەڵە دڕندەکان - هەر لە خۆر و مانگ و گۆی زەوی‌یەوە تا دەگاتە بچووکترین بەدیهێنراو، بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی ئەستۆیان بە وردی و ڕێکوپێکی‌یەکی تابڵێی تەواو، لە نێوان

---

(١) بەڵگەی ڕوون و گومانبڕ لەسەر ئەوەی کە ڕۆزیی حەڵاڵی زیندەوەر بە گوێرەی ڕادەی هەژاریی خۆی پێی دەبەخشرێت و هەرگیز بەپێی توانا و هێز و دەسەڵاتی خۆی ڕۆزی بەدەست ناهێنێت.. ئەوەیە کە دەبینیت بەچکە و ساوایان - کە دارای توانا و خاوەنی دەسەڵات نین - ڕۆزیی فراوان و زۆریان پێ دەبەخشرێت، بەڵام ئاژەڵە دڕندەکان ژیانیان بە سەختی لێ دەگوزەرێت! هەروەها وەك لە بەرچاودایە، ماسی‌یە دەبەنگەکان هەمیشە قەڵەون و، ڕێوی و مەیموونە زیرەك و فێڵبازەکانیش هەردەم لەڕ و لاوازن! کەواتە ڕۆزیی حەڵاڵ بە پێچەوانەی ڕادەی توانا و ئیختیارەوە بۆ بوونەوەر دێت. واتە: تا ئەو بوونەوەرە پشت بە ویستی خۆی ببەستێت، پتر گرفتاری سەختی و ئەرکی قورسی ژیان و گوزەران دەبێت. (دانەر)

گوێڕایەڵی و ملکەچی‌یەکی یەکجار ڕێك و لە چوارچێوەی سام و هەیبەتێکی گەلێ مەزندا، بێ ئەوەی هیچ کامیان بە ئەندازەی سەری پەنجەیەکیش لە سنووری خۆیان لابدەن..

هەموو ئەمانە، بۆمان دەردەخەن کە: بوونەوەران تەنها بە فەرمانی خواوەندی مەزن و خاوەنی "عیززەت" و "شکۆمەندی" دەجوولێن و دەوەستن و کارەکانیان ئەنجام دەدەن.

هەروەها چاودێری کردن و بایەخدانی گشت دایکان - چ دایکانی ناو ڕووەك یان ئاژەڵ یان گرۆی مرۆڤ - بە ساوایان و بێچوانی کۆڵەوار و لاوازی خۆیان، بە چاودێری‌یەکی پڕ لە سۆزی میهرەبانی[1] و، گۆشکردن و پێ گەیاندنی ئەو بەچکە و ساوایانە بە خۆراکێکی پوختی بەتام و لەزەتی وەك "شیر"..

ئەم کارە، مەزنی و فراوانیی درەوشانەوەی: "میهرەبانیی ڕەها و بێ کۆتایی خواوەند" دەردەخات.

جا مادەم پەروەردگار و خاوەن و کارسازی ئەم جیهانە دارای: "کەرەم"ێکی ئاوا فراوان و، "میهرەبانی"یەکی بێ کۆتایی‌یە و، خاوەنی: "عیززەت" و "شکۆمەندی"ی ڕەها و بێ سنوورە..

ئنجا مادەم عیززەت و شکۆمەندیی ڕەها داخوازی تەمێ کردنی هەموو ئەوانەیە کە بە چاوی سووك و گاڵتەجاڕی بۆی دەڕوانن و.. کەرەمی ڕەها و فراوان داواکاری ڕێزلێنانی نەبڕاوەیە و.. میهرەبانیی هەمەلایەنەش داخوازی چاکەکاری‌یەکی وەهایە کە شایستەی خۆی بێت..

مادەم ئەمە - لە لایەکەوە - وەهایە و.. لە لایەکی تریشەوە کە چاو دەگێڕین دەبینین بەشێکی یەکجار کەمی چەشنی دڵۆپێکی دەریا نەبێت هیچ کام لەو داخوازی‌یانە لەم دنیا فانی و تەمەنە کورتەدا نایەنە دی.. ئەوا دەبێ دوای ئەم دنیایە خانەیەکی بەختەوەریی ئەوتۆ ببێت کە شایستەی ئەو کەرەمە فراوانە و شایانی ئەو میهرەبانی‌یە بەرین و هەمەلایەنەیە بێت.

---

(١) بەڵێ، "خۆنەویستی"ی شێر، کە لە کاتی برسێتی‌دا ئەو پارچە گۆشتەی دەستی دەکەوێت خۆی نایخوات و دەیدات بە بێچووە لاوازەکەی و.. مریشکی ترسنۆکیش کە لە پێناوی پارێزگاری کردنی جووجەڵە بچووکەکانی‌دا پەلاماری شێر و سەگ دەدات و.. کە درەختی هەنجیریش شیرێکی پوخت لە قوڕ ئامادە دەکات و دەرخواردی بەرەکانی دەدات کە وەك ساوا و بێچووی ئەو وان. هەموو ئەمانە، لای کەسانی خاوەنی بینایی دڵ بە ڕوونی دەبن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هەموویان تەنها بە فەرمانی یەکێکی میهرەبان و خاوەن کەرەم و سۆز و شەفەقەتێکی ئەوتۆ ئەنجام دراون کە میهر و کەرەم و سۆز و شەفەقەتی ئەو هەرگیز کۆتایی پێ نایەت.. هەروەها ئەنجامدانی چەندەها کار و فرمانی ئەوتۆ کە لەوپەڕی هەست و شعوور و دانایی‌دان، لە لایەن ئەو ڕووەك و ئاژەڵانەی کە دارای هیچ هەست و شعوورێك نین، بە ڕوونی دەری دەخات کە: یەکێکی خاوەن زانیاری و دانایی‌یەکی ڕەها هەیە سەرپەرشتییان دەکات و بەرەو ئەنجامدانی ئەو کارانە دەیانداتەبەر و، ئەوانیش تێکرا بە فەرمانی ئەو دەجوولێنەوە. (دانەر)

ده‌نا وه‌ك ئه‌و كه‌سه‌ی ئینكاریی ئه‌و خۆره‌ی ئاسمان ده‌كات كه‌ ڕۆژی دنیای ڕووناك كردووه‌ته‌وه‌، ده‌بێ ئێمه‌ش – به‌و جۆره‌ – ئینكاریی ئه‌م میهره‌بانی‌یه‌ به‌ چاو بینراوه‌ بكه‌ین. چونكه‌ "نه‌مان"ێك كه‌ گه‌ڕانه‌وه‌ی له‌ دوا نه‌بێت، به‌ڵگه‌ی نه‌بوونی حه‌قیقه‌تی: "میهره‌بانی"یه‌ له‌ناو ئه‌م بوونه‌دا، به‌وه‌ی كه‌ ئه‌و چه‌شنه‌ نه‌مانه‌ هه‌تاهه‌تایی‌یه‌، شه‌فه‌قه‌ت ده‌گۆڕێت به‌: موسیبه‌ت و، خۆشه‌ویستی به‌: كسپه‌ی دڵ و، نیعمه‌ت به‌: به‌ڵا و، له‌زه‌ت به‌: ئازار و، ئه‌و عه‌قڵه‌ش كه‌ ئه‌ندامێكی باش و سوودبه‌خشی مرۆڤه‌، ده‌گۆڕێت به‌: ئه‌ندامێكی نه‌گبه‌تی شووم!

كه‌واته‌ ده‌بێ خانه‌یه‌كی لێپرسینه‌وه‌ی پاداشت و سزا هه‌بێت كه‌ له‌گه‌ڵ "عیززه‌ت" و "شكۆمه‌ندی"ی ئه‌ودا بگونجێت، چونكه‌ ئه‌وه‌تا زۆربه‌ی جار مرۆڤی خۆسه‌پێنی سته‌مكار به‌ ملهوڕی و لووت به‌رزی و، كاكی سته‌م لێكراویش به‌ زه‌لیلی و ملكه‌چی، ژیان ده‌به‌نه‌ سه‌ر، پاشان بێ ئه‌وه‌ی ئه‌ویان سزا و ئه‌میشیان پاداشتی خۆی له‌م خانه‌یه‌دا وه‌ربگرێت، هه‌ردووك وه‌كو یه‌ك كۆچی ماڵئاوایی له‌م دنیایه‌ ده‌كه‌ن!

كه‌واته‌ ئه‌م ئه‌نجامه‌ی كه‌ له‌ دنیادا به‌ چاو ده‌بینرێت، هه‌رگیزاو هه‌رگیز پشت گوێ خستنی ئه‌و تۆڵه‌ و پاداشته‌ی ئه‌وان نی‌یه‌، به‌ڵكو كێشه‌كه‌یان بۆ دادگایه‌كی مه‌زن هه‌ڵگیراوه‌. واته‌ لێپرسینه‌وه‌ی ئه‌م دوانه‌ نه‌ پشت گوێ خراوه‌ و نه‌ هه‌رگیز پشت گوێ ده‌خرێت. ته‌نانه‌ت جاری وا هه‌یه‌ هه‌ندێ تۆڵه‌ و سزا هه‌ر له‌م دنیایه‌دا ده‌سێنرێته‌وه‌ و بۆ ئه‌و دنیا هه‌ڵناگیرێ و دواناخرێت، چونكه‌ سزادانی نه‌ته‌وه‌ سه‌رسه‌خت و یاخی‌یه‌كانی سه‌ده‌كانی پێشین، به‌ ئاشكرا بۆمان ده‌رده‌خه‌ن كه‌ جڵه‌وی مرۆڤ به‌ره‌ڵا نه‌كراوه‌ تا به‌پێی هه‌وا و ئاره‌زووی خۆی ڕه‌فتار بكات، به‌ڵكو هه‌موو ده‌مێ چاوه‌ڕوانی ئه‌وه‌ی لێ ده‌كرێت كه‌ زلله‌كانی خواوه‌ندی "شكۆمه‌ند" و "خاوه‌ن عیززه‌ت"ی ئاراسته‌ بكرێت!

به‌ڵێ، ئه‌م مرۆڤه‌ی كه‌ له‌ نێوان هه‌موو بوونه‌وه‌راندا هه‌ڵبژێرراوه‌ و چه‌ندین ئه‌ركی مه‌زن ته‌نها به‌و سپێرراوه‌ و چه‌نده‌ها توانا و لێهاتنی سروشتیی كامڵیشی دراوه‌تێ.. گه‌ر ئه‌م مرۆڤه‌:

له‌ ڕێی "ئیمان"ه‌وه‌ په‌روه‌ردگاری خۆی نه‌ناسێت.. دوای ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌و په‌روه‌ردگاره‌ له‌ ڕێی به‌دیهێنراوه‌ ناوازه‌ و ڕێكوپێكه‌كانیه‌وه‌ خۆی پێ ناساند..

گه‌ر به‌ "په‌رستن" خۆی له‌و په‌روه‌ردگاره‌ی نزیك نه‌خاته‌وه‌ و خۆشه‌ویستیی ئه‌و به‌ده‌ست نه‌هێنێت.. دوای ئه‌وه‌ی كه‌ په‌روه‌ردگاره‌كه‌ی خۆی لای ئه‌م خۆشه‌ویست كردووه‌ و، به‌و میوه‌ و به‌روبوومه‌ جوان و ڕه‌نگین و جۆراوجۆرانه‌ی كه‌ به‌دیی هێناون و به‌ڵگه‌ی میهره‌بانیی فراوانی ئه‌ون، خۆی پێ ئاشنا كردووه‌..

گەر لە ڕێی "شوکر و ستایشەوە" ڕێزی شایان بەرامبەر پەروەردگاری دەرنەبڕێت.. دوای ئەوەی کە ئەو پەروەردگارە بە نیعمەتە زۆر و زەبەندەکانی، خۆشەویستی و میهرەبانیی خۆی بۆ دەرخستووە..

بەڵێ، گەر ئەم مرۆڤە پەروەردگاری خۆی ئاوا نەناسێت، چۆن هەروا بە هەڕەمەکی و بێ لێپرسینەوە جڵەوی بۆ بەرەڵا دەکرێت و، بێ ئەوەی خواوەندی "خاوەن عیززەت" و "شکۆمەند" خانەیەکی تۆڵە و سزای بۆ ئامادە بکات، هەروا دەستی لێ هەڵدەگرێت؟

یان ئایا دەگونجێ پەروەردگاری میهرەبان، خانەیەکی پاداشت و بەختەوەریی هەمیشەیی بەو ئیماندارانە نەبەخشێت کە:

لە بەرامبەر خۆپێناساندنی ئەو پەروەردگارەوە، ئەوان بە: "ئیمان" ناسیویانە و..

بەرامبەر خۆشویستنیان لە لایەن پەروەردگاریانەوە، ئەوانیش خۆشیان ویستووە و بە "پەرستن" خۆیان لە لا خۆشەویست کردووە و..

بەرامبەر میهرەبانییەکەیشی بۆیان، ئەوان بە: "شوکر" و ستایش ڕێزی شایانیان لە ڕوودا نواندووە؟

## ڕاستیی سێهەم

### دەرگای: " دانایی" و " دادگەری"

### کە درەوشانەوەی ناوی: "الحكيم" و "العادل"ی خوای گەورەیە

ئایا دەگونجێ[(١)] بۆ ئەو بەدیهێنەرە شکۆمەندەی کە یاسای بوونەوەری هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان، بەوپەڕی "دانایی" و ڕێسا و "دادگەری" و تەرازووکارییەوە سازاندووە و ڕێکی خستووە و، بەمەش دەستەڵاتداریی پەروەردگارێتیی

(١) دەستەواژەی: "ئایا دەگونجێ" گەلێ جار لەم پەیامەدا دووپات دەبێتەوە، چونکە مەبەستێکی گرنگ بەدەستەوە دەدات کە بریتییە لەوەی: زۆربەی جار "کافرێتی" و "گومڕایی" لە ئەنجامی "بەدوورزانین"ەوە پەیدا دەبێت. واتە مرۆڤ ئەو شتەی باوەڕی پێی نییە بە دووری دەزانێت لە تەرازووی ژیرییەوە، ئنجا بە مەحاڵی دادەنێت و پاشان دەست بە کوفر و ئینکاری دەکات. بەڵام ئەم وتەیە (پەیامی حەشر) بە چەندین بەڵگەی گومانبڕ چەسپاندی کە: بەدوورزانین و مەحاڵیی ڕاستەقینە و، دووری لە تەرازووی ژیری و، سەختی و گیروگرفتی ڕاستەقینە و ئاڵۆز کە هەرگیز مومکین نەبێ وابێت، تەنها لە "کافرێتی" و ڕێبازی "گومڕایی"دایە.. گونجاویی ڕاستەقینە و، مەعقوولییەتی تەواوەتی و، ئاسانیی تا ڕادەی پێویستیش، تەنها لە ڕێی ئیمان و ڕاستەشەقامی ئیسلامدایە.

بە کورتی: فەیلەسووفەکان تەنها لە ئەنجامی "بەدوورزانین"ەوە پێیان بەرەو ئینکاری کردن هەڵخلیسکا. ئەم "وتەی دەهەم"ەش بە دەستەواژەی: "ئایا دەگونجێ" ڕوونی دەکاتەوە کە دووریی ڕاستەقینە لە تەرازووی ژیرییەوە لە کوێدایە.. بەم کارەش مشتەکۆڵێکی قایمی ئاراستەی دەموپلی ئەوان کردووە. (دانەر)

خۆی لـه پێش‌چـاوانـدا ئاشـكرا كـردووه.. ئـەم بەدیهێنـەره شــكۆمەندە، بـه "چـاكـه‌كاری" مامەڵـه و ڕەفتـار لـه‌گـەڵ ئەوانـەدا نـه‌كات كـه هانایـان بـۆ لای پـەروەردگاریی ئـەو بـردووه و ملكەچی "دانایی" و "دادگەری"ی ئەو بوون و، لە هەمان كاتدا "سزا"ی ئەوانەش نەدات كـه بە كافرێتی و سەركەشی و ستەمكاری، سـەرپێچی‌یان لـەو "دانـایی" و "دادگـەری"یـەی ئـەو كردووه؟

خۆ مەگەر بە دەگمەن، دەنا مرۆڤ لەم ژیانە فانی‌یەی دنیـادا ڕووبـەڕووی ئـەو پاداشـت و تۆڵەیە نابێتەوە كە شایانیەتی، بەو جـۆرەی شایستەی "دانـایی" و "دادگـەری"ی پـەروەردگار بێـت، بـەڵكو زۆربـەی جـار سـزادان و پاداشـتدانەوەكەی دوا دەخرێـت، ئـەوەتا زۆربـەی گومڕایان بێ ئەوەی سزا بدرێن و زۆربەی ئەهلی هیدایەتیش بێ پاداشـت وەرگرتـن، كۆچـی ماڵئاوایی لەم دنیایە دەكەن.. كەواتە دەبێ ئەو كێشەیە بـە دادگایـەكی دادگـەر سـپێررابێت و لە بەیەك گەیشتنەوەیەكدا كە بەختەوەریی مەزنی بە دوادا بێت، یەكلایی بكرێتەوە.

بەڵێ، ئاشكرایە كە ئەو كەسەی كاروباری گـەردوون بـەڕێوە دەبـات، بـه "دانـایی"یـه‌كی یەكجار ڕەها ئەم كارە دەكـات. خـۆ ئەگـەر بەڵگەیشـت لەسـەر ئـەم ڕاستی‌یە دەوێـت، ئـەوا فەرموو سەیری بایەخدان و چاودێری كردنی پەروەردگار بكـە سـەبارەت بـە دانـانی سـوود و بەرژەوەندی‌یەكان لە هەموو شتێكدا، نابینیت گشت ئەندامەكانی لەشی مـرۆڤ چ ئێسـك و چ دەمارەكـان و چ خانـەكانی لەشــی و چ هـەر جێ و بەشـێكی تـری جەسـتەی، چـەندین سـوود و دانـایی جۆراوجۆریـان تێدا ڕەچـاو كـراوە؟ تەنانـەت بـە ئـەندازەی ژمـارەی ئـەو بەرانەی كە درەختێك دەیـانگرێت ئـەوەندەش سـوود و وردەكـاری و نـهێنی لـه ئەندامـەكانی لەشـیدا هەیـه. ئەمـه سـەرەڕای ئـەو خشـتی و ڕێكوپێكی‌یـه نـاوازە و تـەواوەی كـه لـه دروستكردنی هەموو شتێكدا هەن و بەڵگەی ئەوەن كە گشت كاروبارەكان بە "دانایی‌یـەكی ڕەها" ئەنجام دەدرێن.

بـەڵێ، دانـانی پرۆگرامـی وردی گوڵێكـی جـوان لـە دوو توێـی تـۆوە بچكۆلەكـەیدا.. هەروەها نووسینی كارنامە و مێژووی ژیان و پێڕستی گشت ئامێر و ئەندامەكانی درەختێكی زەبەلاح، بە قەڵەمی مەعنەویی قەدەر، لە نێوان ناوكۆلەكەیدا..

هەموو ئەمانە، بە ڕوونی بۆمان دەردەخەن كە تەنها قەڵەمی "دانایی‌یەكی ڕەهـا"یـه دەست لەو كارانە وەردەدات و بەڕێوەیان دەبات..

هـەروەها بوونـی جوانـی و قەشـەنگیی لەڕادەبـەدەر لـه بەدیـهێنان و دروسـتكردنی هـەموو شتێكدا، دەری دەخات كـه تەنـها دروستكەرێكی خـاوەن "دانـایی ڕەهـا و بـێ سـنووره" كـه خاوەنی ئەم داهێنان و نەخش و نیگارە بێ وێنانەیە.

بـەڵێ، دانـانی پێرسـتی گشـت بوونـەوەران و، کلیلـەکانی هـەموو گـەنجینەکانی میهرەبانی و، ئاوێنەی گشت ناوە جوانەکانی خوای گەورە، لەم جەستە بچووکەی مرۆڤدا.. بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ڕوون و ڕەوانیی سنعەتی ناوازەی پەروەردگار.

جـا ئایـا دەگونجـێ ئـەم چەشـنە "دانـایی"یـەی کـە بەسـەر ئـەم هـەموو کاروبـارە پەروەردگاریی‌یانەدا زاڵ و دەستەڵاتدارە، بە "چاکـەکاری" مامەڵـە و ڕەفتـار لەگـەڵ ئـەو کەسانەدا نەکات کە ڕۆشتوونەتە ژێر سایەکەی و بە "ئیمانداری" ملیان بۆ کەچ کـردووە؟.. یان ئایا دەگونجێ پاداشتی هەتاهەتایی‌یان نەداتەوە؟

ئەی ئایا بەڵگەیشت دەوێ لەسەر ئەوەی کە هەموو کاروبارەکانی ناو بوونەوەر تێکڕا بە: "دادگەری" و تەرازووکاری ئەنجام دەدرێن؟

دە فەرموو بڕوانە:

ئەوەتا هەموو شتێك لـەم بوونـەوەرەدا "بـوون"ێکـی تایبـەتیی پێ بەخشـراوە و بـە چـەندین پێوەری ورد و تایبەت بۆی دەسـتنیشان کـراوە و وێنـە و شێوەیەکی دیـاری‌کراوی بـە بـەردا بڕاوە و لە بارێکی گونجاودا دانراوە..

خۆ هەموو ئەمانەش بە ڕوونی دەری‌دەخەن کە گشت کاروبارەکان بـەپێی "دادگـەری" و تەرازووکاریی ڕەها جێ‌بەجێ دەکرێن..

هـەروەها دەبینیـت هـەموو یـەکێ – بـەپێی توانـا و بـەهرە و لێـهاتنی خـۆی – مـافی خـۆی دراوەتێ. واتە: هەموو ئەو شتانەی پێ بەخشراوە کە بـۆ "بـوون"ی پێویستی پێیانـە و، گشـت ئەو شتانەشی بۆ دابـین و ئامـادە کـراوە کـە لـە باشـترین دۆخـدا بیهێڵنـەوە.. هـەموو ئەمانـەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دەستی "دادگەری‌یەکی ڕەها" کارەکان ئەنجام دەدات..

هەروەها بەهاناچوون و بەدەنگەوەهاتنی هەمیشە و بەردەوامی ئەو داواکاری‌یانەی کە لـە لایەن بوونەوەرانەوە، چ بە زمانی لێهاتنیان و چ بە زمانی داخوازیی سروشتیان و چ بـە زمـانی تـەنگ پێ‌هەڵـهاتن و ناچاری‌یـان، دەری دەبـڕن.. ئـەم بەهاناوەچوونـەش، دەری دەخـات کـە تەنـها "دادگەری‌یـەکی ڕەهـا" و "دانایی‌یەکی بێ سنوور"ە وا هەمیشـە ڕەوڕەوەی بوونـەوەر دەخاتە گەڕ و کارەکانی ناوی ڕادەپەڕێنێت.

جـا ئایا هـەرگیز دەگونجێ ئـەم "دادگـەری" و "دانایی"یـەی کە بـە هانـای بچووکـترین داخوازیی لاوازتریـن بەدیهێنراوەوە دەڕۆن، ئـەو پێویسـتی و داواکاری‌یـە هـەرە مەزنـەی "مانەوە و هەمیشەیی" کە خواست و داواکاریی مەزنترین بەدیهێنراوی وەك مرۆڤە، پشـتگوێ بخەن و بۆی نەهێننەدی؟

یان ئایا ده‌گونجێ ئەم "دانایی" و "دادگەری"یە، دەست بە ڕووی گرنگترین و مەزنترین ئاوات و هیوا و خواستی مرۆڤەوە بنێن و، بەمەش حیشمەتی پەروەردگاریێتی نەپارێزن لەوەی كە بەدەم هانای بەندەكانەوە نەڕوات؟

ئەم مرۆڤەی كە ژیانێكی كورت لەم دنیا فانییەدا بەسەر دەبات، ڕاستی و حەقیقەتی ئەم دادگەرییەی بە تەواوی بۆ نەهاتووەتەدی و بۆیشی نایەتەدی، بەڵكو هاتنەدیی ئەم خواست و ئاواتەی بۆ دادگایەكی گەلێ مەزن هەڵدەگیرێت، چونكە "دادگەریی ڕاستەقینە" داخوازی ئەوەیە كە ئەم مرۆڤە لەسەر بناغەی بچووكیی بارست و قەبارەكەی پاداشت و تۆڵەی بۆ دەستنیشان نەكرێت، بەڵكو لەسەر بناغەی گەورەیی تاوانەكانی و گرنگیی ماهییەتی و مەزنیی ئەركی سەرشانی تۆڵەی لێ بسێنرێت یاخود پاداشت بدرێتەوە.

جا لەبەر ئەوەی ئەم دنیا تەسك و كاتییە جێی ئەم چەشنە دادگەری و داناییە مەزنەی تایبەت بە: "مرۆڤی بۆئەبەد بەدیهاتوو"ی تێدا نابێتەوە، ئەوا دەبێ - بێ هیچ گومانێك - خواوەندی دادگەر و مەزنی خاوەن جوانی و، دانای شكۆمەند، بەهەشتێكی هەمیشەیی و دۆزەخێكی هەتاهەتایی ببێت، بۆ مەبەستی هێنانەدیی تەواوەتیی داخوازییەكانی ئەو "دانایی" و "دادگەری"یەی خۆی!

## ڕاستیی چوارەم

دەرگای: "بەخشندەیی" و "جوانی"

كە درەوشانەوەی ناوی: "الجواد" و "الجميل"ی خوای گەورەیە

ئایا دەگونجێ "سەخاوەت و بەخشندەیی"یەكی ڕەها و..

سەروەت و سامانێكی نەبڕاوە و..

چەندەها گەنجینەی بێ كۆتایی و..

"جوانی"ی هەمیشەیی بێ وێنە و..

"كەماڵ"ی هەتاهەتایی بێ خەوش و ناتەواوی..

داخوازی خانەیەكی بەختەوەری و شوێنێكی میواندارییی ئەوتۆ نەبن تا بە هەمیشەیی گشت ئەو كەسانەی تێدا بمێننەوە كە موحتاج و سوپاسگوزاری "سەخاوەت"ن و، موشتاق و نرخ شناسی "جوانی"ن؟

بەڵێ، ڕازاندنەوەی جیهان بەم دروستكراوە جوان و خنجیلانانە و..

داگیرساندنی خۆر و مانگ تیایدا بە چەشنی چرا و..

ڕاخستنی سفرەی گۆی زەوی بۆ نیعمەتەکان و، پڕکردنی ئەو سفرەیەش لە خۆشترین و بەتامترین خواردەمەنیی بەلەزەتی جۆراوجۆر و..

ئامادە کردنیدرەختە بەردارەکان لە شێوەی چەند قاپ و دەفرێکدا، کە هەموو وەرزێك تازە دەبنەوە..

هەموو ئەمانە، سەخاوەت و دەست ڕەنگینی و بەخشندەیییەکی بێ سنوور دەردەخەن.

جا ئەم چەشنە بەخشندەیی و سەخاوەتە ڕەهایە و، ئەم جۆرە گەنجینە لەبن نەهاتووانە و، ئەم تەرزە میهرەبانییە فراوان و هەمەلایەنگیرە.. دەبێ میوانخانەیەکی هەمیشەیی و خانەیەکی بەختەوەریی هەتاهەتاییییان بێت کە هەر شتێك دڵی مرۆڤ حەزی لێ بکات و دەروونی بۆی بشنێت، تیایدا ئامادە کرابێت..

ئنجا - بێ هیچ گومانێك - داخوازی ئەوەیشن کە لەزەتچێژانی ئەو خانەی بەختەوەرییە هەر بە هەمیشەیی و هاودەم لەگەڵ ئەو بەختەوەرییە هەتاهەتاییەدا بمێننەوە، تاکو بە تەواوی لە ئازاری نەمان و جودایی دوور و پارێزراو بن، چونکە هەروەك نەمانی لەزەت مرۆڤ گرفتاری ئازار دەکات، بە هەمان جۆریش نەمانی ئازار لەزەتی دەرخوارد دەدات. دەی خۆ - بێ هیچ گومانێك - ئەم چەشنە سەخاوەتە هەرگیز بواری ئازاردانی میوانەکانی خۆی نادات.

واتە: "بەخشندەیی" داخوازی بوونی بەهەشتێکی هەمیشەییە و، داواکاری هەتاهەتاییبوونی ئەوانەیشە کە موحتاجی ئەو بەهەشتەن و تیایدا دەمێننەوە، چونکە:

سەخاوەت و بەخشندەیی ڕەها، داخوازی چاکە و بەخششی ڕەهان..

چاکە و بەخششی بێکۆتاییش، داواکاری ئەوەیە کە هەموو ئەو کەسانەی چاکەیان لەگەڵدا کراوە و نیعمەتیان دراوەتێ، بۆ "هەتاهەتایی" منەتبار و بەهرەمەندی ئەو نیعمەتانە بن کە پێیان بەخشراوە..

ئەمەش داخوازی بەردەوامی و هەمیشەیی نیعمەت بەخشینە بەو کەسانەی کە شایستەی چاکە لەگەڵ کردنن، تاکو شوکرانەبژێری و سوپاسگوزاری و بەرخورداربوونی خۆیان لەو نیعمەتانە - لە ئاستی ئەو نیعمەت بەخشینەدا - دەربڕن. دەنا ئەو لەزەتە کەمەی ئەم ماوە کورتەی دنیا، کە یەکسەر نەمانی بە دوادا دێت، هەرگیز لەگەڵ داخوازییەکانی ئەم سەخاوەت و بەخشندەییە ڕەهایەدا ڕێك ناکەوێت.

پاشان سەیری پیشانگاکانی گشت لایەکی جیهان بکە، کە هەر هەموویان دیمەنێك لە دیمەنەکانی سنعەتی خوای گەورە پێکدەهێنن.. سەرنج لەو بەیاننامە و ڕاگەیاندنە پەروەردگارییانە بدە[1] کە ڕووەك و زیندەوەرانی سەر ڕووی زەوی هەڵیان گرتوون.. گوێ لەو بانگەوازکار و شارەزایانە ڕابگرە کە وا خەڵکی بۆ لای گشت لایەنەکانی جوانیی پەروەردگاریان بانگ دەکەن و، بریتین لە: پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - و ئەولیا و پیاوچاکان و، بزانە چۆن هەموو ئەوانە سنعەتی ناوازەی پەروەردگار لە بەرچاواندا دەردەخەن و سەرنجی خەڵکیی بۆ لا ڕادەکێشن و، بەمەش ڕێنمایی گشت ئەو خەڵکە دەکەن بۆ بینینی کەماڵی سنعەتی خواوەندی شکۆمەندیان!

کەواتە بنیاتنەر و دروستکەری ئەم جیهانە، دارای "کەماڵ"ێکی نهێنی و بێ وێنە و مەزنی ئەوتۆیە کە هەستی سەرسوورِمان لای سەرنجدەرانی بورووژێنێت و، دەیەوێ لە ڕێی ئەم بەدیهاتووە ناوازانەیەوە ئەو کەماڵە پەنهانەی خۆی ئاشکرا بکات، چونکە کەماڵی پەنهانی بێ خەوش و دوور لە ناتەواوی دەبێ لە بەرچاوی کەسانی بینەری سەرسوورِماوی نرخ شناس و قەدر زاندا دەربخرێت و ئاشکرا بکرێت. ئنجا "کەماڵی هەمیشەیی"ش داخوازی دەرکەوتنی هەمیشە و بەردەوامە و، ئەمەش - لە خۆیدا - داواکاری بەردەوامبوونی ئەوانەیە کە قەدری دەزانن و نرخ شناس و ڕێز لێگری ئەو کەماڵەن، چونکە ئەو سەرنجدەرە سەرسوورِماوەی کە مانەوەکەی بەردەوام و هەمیشەیی نەبێت، بە تەواوی ئەو کەماڵەی لەبەرچاو دەکەوێت و هیچ نرخ و بەهایەکی ئەوی لە لا نامێنێت[2]. پاشان ئەم بوونەوەرە

(١) بەڵێ، هەموو گوڵێکی جوان کە لەوپەڕی ڕازاوەیی و ئارایشتدایە.. هەروەها گشت بەرێکی ڕێکوپێك کە تابلۆی دارای وردەکاری و داهێنانە و، هەریەکەیان لە کۆتایی چەند پەلێکی ڕەق و تەقی چەشنی ئێسکدا بە دەزوولەیەکی باریك هەڵواسراون.. بێ گومان هەریەك لەمانە ڕاگەیاندن و بەیاننامەیەکی ئەوتۆن کە هەموو کەسێکی خاوەن هەست و شعوور لایەنەکانی جوانیی سنعەتی خواوەندی بەدیهێنەر و موعجیزەکار و دانای تێدا دەخوێننەوە! ئیتر بۆ خۆت گشت ڕووەك و زیندەوەران لەسەر ئەم نموونەیە قیاس بکە. (دانەر)

(٢) بەڵێ، ئەم ڕووداوە وەك پەندێك دەماودەمی پێ دەکرێت و ناوبانگی دەرکردووە، کە دەگێڕنەوە: جارێکیان ئافرەتێکی تابلۆی جوان لە کۆڕی تایبەتیی خۆیدا یەکێکی لەوانە کردووەتە دەرەوە کە شەیدا و سەرسوورِماوی جوانیی ئەو بوون. ئەویش لە ناچاری و داخی دڵی خۆیدا وتوویەتی: "دەك ئەولاتر بچێ! چەندە ناشیرینە"! بەمەش ئینکاریی ئەو جوانییەی ڕاگەیاندووە.. هەروەها: جارێکیشیان ورچێك بە ژێر داری مێوێکدا تێدەپەڕێت کە گەلێ هێشووی خۆش و بەلەزەتی ترێی پێدا شۆڕ بووبونەوە، ویستی هەندێ لەو ترێ شیرین و بەلەزەتانە بخوات، کاتێ کە دەستی بۆ پەل و هێشووەکانی برد دەستی پێیان نەگەشت و نەیشیتوانی بە درەختەکەدا سەر بکەوێت، لەبەر خۆیەوە بە داخ و حەسرەتەوە وتی: "لاییە، نایخۆم! ترشە"! بەم قسەیە دڵی خۆی دایەوە و لە تاوا ئەوێی بەجێ هێشت و ڕۆشت بە ڕێی خۆیەوە! (دانەر)

سەیر و، بێوێنە و، وردەکار و، ڕەنگین و، ناوازانەی کە بە هەموو گۆشە و لایەکی ئەم گەردوونەدا بڵاو بوونەتەوە، بە ڕوونی و چەشنی ئەوەی کە ڕووناکیی ڕۆژ دەبێ بە بەڵگەی بوونی خۆر، ئەم بوونەوەرانەش بە هەمان چەشن بەڵگەن لەسەر لایەنە قەشەنگەکانی ئەو جوانییە مەعنەوییەی کە هیچ شتێك نییە هاووێنەی بێت و، لە هەمان کاتیشدا - ئەو بوونەوەرانە - ڕووە خنجیلە و ناسکۆلەکانی جوانیی پەنهانی بێوێنەت پیشان دەدەن[1].

پاشان درەوشانەوەی ئەو جوانی و قەشەنگییە خاوێن و ڕەنگینەش - بێ هیچ گومانێك - ئاماژە بۆ بوونی چەندین گەنجینەی پەنهان دەکەن کە وان لە نێوان هەموو - تەنانەت یەكبەیەکی - ناوە جوانەکانی خوای گەورەدا.

جا هەروەك ئەو "جوانی"یە پەنهان و بەرز و بێ وێنەیە داواکاری ئەوەیە کە لە ئاوێنەی جوانی دەرەوەدا جوانییەکانی خۆی ببینێت و، لەناو ئاوێنەی خاوەن هەست و نەستان و تاسەمەند و موشتاقانی جوانیشدا سەیری نرخ و بەها و پێوەرەکانی جوانیی خۆی بکات.. بە هەمان جۆریش دەیەوێت ئەو جوانییەی دەربکەوێت و بدرەوشێتەوە تاکو بە چاوی کەسانی تریش جوانییە خۆش ویستراوەکەی خۆی ببینێت. واتە: دەبێ لە دوو ڕووەوە سەیری جوانیی ڕەهای ئەو بکرێ و ببینرێت:

**یەکەم:**

بینینی ئەو جوانییە لە لایەن خۆیەوە، لە چەندین ئاوێنەی جۆراوجۆر و ڕەنگاوڕەنگدا..

**دووهەم:**

بینینی ئەو جوانییە بە چاوی سەیرکەرانی تاسەمەند و، سەرسووڕماوی تامەزرۆ و نرخ شناسی ئەو جوانییە.

واتە: "قەشەنگی" و "جوانی" داخوازی ئەوەن کە "ببینرێن" و "پیشانیش بدرێن".

ئەم بینین و پیشاندانەش داواکاری ئەوەن کە کەسانی بینەر و موشتاق و نرخ شناس و سەرسووڕماوی خۆیان هەبێت.

جا مادەم ئەو "قەشەنگی" و "جوانی"یە، هەمیشەیی و هەتاهەتایین، ئەوا دەبێ کەسانی تاسەمەند و نرخ زانیشیان - وەك خۆیان - هەمیشەیی و هەتاهەتایی بن، چونکە جوانیی بەردەوام و هەمیشەیی، بە موشتاق و تاسەمەندی لەناوچووی فانی ڕازی نابێت!

---

(١) ئەو بوونەوەرانەی کە وەك ئاوێنە وان، هەرچەند خۆیان گرفتاری نەمان و لەناوچوون دەبن بەوەی کە یەك لە دوای یەکتر دێن و دەڕۆن، بەڵام مانەوەی درەوشانەوەی هەمان جوانیی یەك بە یەکیان لە ڕوخساری ئەوانەی دوای خۆیشیاندا، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو جوانییە موڵکی خۆیان نییە، بەڵکو چەند نیشانە و بەڵگەیەکن لەسەر: "جوانی و قەشەنگییەکی پاك و خاوێن" کە لەواندا دەدرەوشێتەوە! (دانەر)

له‌به‌ر ئه‌وه‌، ئه‌و بینه‌ره‌ی كه‌ هه‌ست به‌ نه‌مان ده‌كات و بڕیاری "نه‌گه‌ڕانه‌وه‌ی بۆ ژیان"ی له‌سه‌ر خۆی ده‌ركردووه‌، ته‌نها به‌ بیر كردنه‌وه‌ی له‌و نه‌مانه‌، خۆشه‌ویستی‌یه‌كه‌ی به‌رامبه‌ر به‌و جوانی‌یه‌ ده‌بێت به‌: دوژمنایه‌تی و.. سه‌رسووڕمانه‌كه‌ی به‌: گاڵته‌ پێ كردن و.. ڕێزلێنانه‌كه‌شی به‌: ئیهانه‌ و سووكایه‌تی. چونكه‌ مرۆڤی خۆویستی خۆپه‌رست هه‌روه‌ك دوژمنایه‌تیی ئه‌و شتانه‌ ده‌كات كه‌ نایانزانێت و په‌ی‌یان پێ نابات، به‌ هه‌مان جۆر دوژمنی ئه‌و شتانه‌یشه‌ كه‌ ده‌ستی پێیان ناگات! له‌ ئه‌نجامی ئه‌مه‌یشه‌وه‌ دوژمنایه‌تی و، ڕق و، قین و، ئینكاری به‌رامبه‌ر به‌و جوانی‌یه‌ له‌ ناخی خۆی‌دا هه‌ڵده‌گرێت، كه‌ ده‌بوو به‌ خۆشه‌ویستیی بێ كۆتایی و شه‌وق و تاسه‌ی نه‌بڕاوه‌ و سه‌رسووڕمانی بێ سنوور و شایانی خۆی، پێشوازی بكرایه‌.

ئا لێره‌دا تێ‌ده‌گه‌ین كه‌ بۆچی مرۆڤی "كافر" دوژمنی خوای گه‌وره‌یه‌.

جا مادده‌م:

ئه‌و "سه‌خاوه‌ته‌" بێ سنووره‌ی كه‌ له‌ به‌خشنده‌یی ئه‌ودا هه‌یه‌ و..

ئه‌و "جوانی و قه‌شه‌نگی"یه‌ی كه‌ هاووێنه‌یان نی‌یه‌ و..

ئه‌و "كه‌ماڵ"ه‌ش كه‌ هیچ ناته‌واوی‌یه‌كی تێدا نی‌یه‌.

داخوازی:

هه‌میشه‌یی بوونی شوكرانه‌بژێره‌كان و.. مانه‌وه‌ی نرخ شناسه‌ موشتاقه‌كانیانن..

ئه‌مه‌ له‌ لایه‌كه‌وه‌..

له‌ لایه‌كی تریشه‌وه‌، كۆچ كردن و ون بوونی به‌ په‌له‌ و خێرای هه‌موو یه‌كێكی ئه‌و خه‌ڵكه‌ له‌م میوانخانه‌یه‌ی دنیادا به‌ چاوی خۆمان ده‌بینین، بێ ئه‌وه‌ی له‌ تام و له‌زه‌تی چاكه‌كاری‌یه‌كانی ئه‌و "سه‌خاوه‌تمه‌ندی"یه‌ به‌رخوردار ببێت جگه‌ له‌ ئه‌ندازه‌یه‌كی كه‌می وا نه‌بێت كه‌ ئیشتیهای ببزوێنێت و.. له‌ نووری ئه‌و "جوانی" و "كه‌ماڵ"ه‌ش به‌هره‌مه‌ند نابێت و تروووسكایی‌یه‌كی كتوپڕی نه‌بێت هیچی تری لێ نابینێت..

مادده‌م وایه‌.. ئه‌وا - بێ هیچ گومانێك - ئه‌و كۆچ و گه‌شته‌ی ئه‌وان به‌ره‌و چه‌ندین باخچه‌ و دیمه‌نی هه‌میشه‌یی و هه‌تاهه‌تایی ئه‌وتۆیه‌ كه‌ ئیتر نه‌مانی به‌ دوادا نه‌یه‌ت.

**پوخته‌ی ئه‌م قسانه‌:**

هه‌روه‌ك ئه‌م جیهانه‌ له‌ ڕێی بوونه‌وه‌ره‌كانی ناویه‌وه‌ به‌ڵگه‌یه‌كی گومان نه‌هێڵه‌ له‌سه‌ر: "بوون"ی دروستكه‌ر و به‌دیهێنه‌ری كه‌ریم و شكۆمه‌ندی خۆی.. به‌ هه‌مان جۆر، سیفه‌ته‌ پیرۆز و خاوێنه‌كانی ئه‌و خواوه‌نده‌ و ناوه‌ جوانه‌كانیشی به‌ڵگه‌یه‌كی بێ گومانن له‌سه‌ر خانه‌ و لانه‌ی "ئه‌و دنیا" و، داخوازی ده‌بن.

## ڕاستیی پێنجەم
### دەرگای: "شەفەقەت" و "بەندایەتیی محەممەد ﷺ"
### کە درەوشانەوەی ناوی: "المجیب" و "الرحیم"ی خوای گەورەیە

ئایا دەگونجێ پەروەردگارێکی خاوەنی "میهرەبانیی فراوان" و "شەفەقەتی نەبڕاوە"ی ئەوتۆ کە نهێنیترین پێداویستیی بچووکترین بەدیهێنراو ببینێت و، بە سۆز و میهرەبانی‌یەکی فراوانی لەبن نەهاتوو بەهانایەوە بڕوات، بە ڕادەیەك کە ئەو بەدیهێنراوە هەر بەخۆیشی نەزانێت کە چۆن ئەو پێداویستی‌یەی بۆ ئەنجام دراوە.. پەروەردگارێك کە ئەسپاییترین دەنگی شارراوەترین بوونەوەر ببیستێت و فریای بکەوێت و.. بەدەم داواکاری و نزای هەموو ئەوانەیشەوە بڕوات کە چ بە زمانی حاڵ و چ بە زمانی گوفتار، لێی دەلاڵێنەوە..

ئایا دەگونجێ ئەم پەروەردگارە "بەدەنگەوە هاتوو" و "میهرەبان"ە، گرنگترین پێداویستیی مەزنترین بەندە و خۆشەویستی ناو بەدیهاتووانی خۆی[1] جێبەجێ نەکات و، بە هانای داواکاری‌یەکەیەوە نەڕوات و فریای نەکەوێت؟

ئەوەتا پەروەردەکردنی ڕێك و ناوازە و جوانی بێچووان و لاوازانی ناو زیندەوەران و ژیاندنیان بە ئاسانی و نەرمونیانی‌یەکی ئاشکرا، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە خاوەنی ئەم

---

(١) بەڵێ، ئەو فەرمانڕەوایەی کە لە ماوەی هەزار و سێ‌سەد و پەنجا ساڵی ڕەبەقدا [ئێستا زیاد لە هەزار و چوار سەدو بیست ساڵە] لە فەرمانڕەوایەتی‌دا بەردەوام بووە.. ئەو کەسەی کە ژمارەی نەتەوەکەی – زۆربەی کات – لە سێ سەد و پەنجا ملیۆن تێپەڕ دەکات و، هەموو ئەمانەش هەرچی ڕۆژە پەیمان و بەڵێنی لەگەڵدا نوێ دەکەنەوە و، شایەتی لەسەر پایە بڵندیی ئەو دەدەن و بەوپەڕی ویست و ئارەزووی خۆیانەوە ملکەچی تەواوی فەرمانەکانی دەبن.. ئەو کەسەی کە نیوەی گۆی زەوی و پێنجیەکی مرۆڤایەتی لە ژێر سایەی پیرۆزی ئەودان و مۆرکی مەعنەویی ئەویان لەسەر نەخشاوە و، زاتی پیرۆز و شەریفی ئەو خۆشەویستی دڵ و پەروەردەکاری گیان و پاکژکەری دەروونیانە.. ئەو کەسەی کە خاوەنی پلەیەکی ئاوا بڵندە، بێ هیچ گومانێك، بەندەی هەرە مەزنی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

جا ئەم بەندە بەڕێزەی کە ئاوا زۆربەی جۆرەکانی بوونەوەران پێشوازی و بەخێرهاتنیان لە پێغەمبەرایەتی و ئەرکی سەرشانی ئەو کردووە و، لەم پێناوەشدا هەریەکەیان یەکێ لە بەروبوومەکانی موعجیزاتی ئەویان گرتووە و بەرهەمیان هێناوە.. بێ هیچ گومانێك ئەم پێغەمبەرە مەزنە ﷺ خۆشەویستترین کەسی بەدیهێنەری مەزنمانە.

پاشان ئەو داواکاری‌یەی گرۆی مرۆڤ هەیەتی و بە هەموو توانا و لێهاتنێکیەوە تکای مانەوە دەکات و بۆ داوای هاتنەدیی ئەم خواستە توند و بەتینەی دەروونی خۆیشی دەلاڵێتەوە، تاکو لەو هەڵدێرەی کە دەیهاوێتە نزمترینی پلە پەست و نزمەکانەوە ڕزگاری ببێت و بەرەو بەرزترین چلەپۆپەی بڵندی سەر بکەوێت و بەرز ببێتەوە.. بێ هیچ گومانێك ئەم داواکاری‌یە خواستێکی گەلێ مەزنە. جا ئەو کەسەش کە بە ناوی گرۆی مرۆڤەوە لە بەردەم خواوەندی بەجێهێنەری پێویستی‌یەکاندا پێشکەشی دەکات – ئەویش بێ هیچ گومانێك – مەزنترینی هەموو بەندەکانە. (دانەر)

بوونـه‌وه‌ره بـه‌ په‌روه‌ردگاریتی‌یـه‌كی ئـه‌وتۆ ده‌یانخاته‌گـه‌ڕ و بـه‌ڕێوه‌یانده‌بات كـه‌ دارای میهره‌بانی‌یه‌كی بێ سنووره. جا ئایا ژیریی مـرۆڤ بـاوه‌ڕ بـه‌وه‌ ده‌كـات په‌روه‌ردگاریتی‌یـه‌كی ئـاوا كـه‌ خـاوه‌نی كـه‌مالی شـه‌فه‌قه‌ت و سۆز و میهره‌بانی‌یـه‌، داواكـاری و نـزا و لالآنــه‌وه‌ی به‌ڕێزترین به‌دیهێنراوی خۆی ئه‌نجام نه‌دات؟

هه‌روه‌ك ئه‌م ڕاستی‌یه‌م له‌ "وته‌ی نۆزده‌هه‌م"دا ڕوون كرده‌وه‌، لێره‌شدا جارێكی تر ڕوونی ده‌كه‌مه‌وه‌ و ده‌ڵێم: ئه‌ی ئه‌و هاوڕێیه‌م كه‌ له‌گه‌ڵ نه‌فسی خۆمـدا گوێـم لـێ ڕاده‌گریـت! لـه‌ یادته‌ كه‌ له‌ چیرۆكه‌كـه‌دا وتـرا: كۆبوونه‌وه‌یـه‌ك لـه‌ دوورگه‌یـه‌كدا سـاز كـراوه‌ و نوێنـه‌رێكی به‌ڕێزیش له‌وێدا ئاماده‌یه‌ و وتار ده‌خوێنێته‌وه‌؟ جا ڕاستی و ناوه‌رۆكی ئه‌و مه‌به‌سته‌ی كه‌ ئه‌و چیرۆكه‌ ئاماژه‌ی بۆ كرد، ئه‌مه‌ی خواره‌وه‌یه‌:

وه‌ره‌ – ئه‌ی هاوڕێكه‌م! – با له‌ پۆشاكی "كات" خۆمان داماڵین و به‌ "بیر" بۆ سـه‌رده‌می پێغه‌مبه‌رایه‌تی و به‌ "ئه‌ندێشه‌"یش به‌ره‌و دوورگه‌ی ناوبراو بڕۆین، تاكو به‌ دیدار و سه‌رلێدانی ئه‌و نوێنه‌ر و پێغه‌مبه‌ره‌ به‌ڕێزه‌ ﷺ شـاد و شـه‌ره‌فمه‌ند ببـین لـه‌ گه‌رماوگـه‌رمی ئـه‌و ده‌مـه‌ی كـه‌ خه‌ریكی ئه‌نجامدانی كار و ئه‌ركی سه‌رشانیه‌تی.

بڕوانه‌! هه‌روه‌ك به‌ "پێغه‌مبه‌رایه‌تی‌یه‌كه‌ی" و ئه‌و هیدایه‌ت و ڕێنمایی‌یـه‌ی له‌گـه‌ڵ خـۆیدا هێنـای، بـوو بـه‌هۆی به‌ختـه‌وه‌ریی گـرۆی مـرۆڤ، هـه‌ر ئه‌ویشـــه‌ كـه‌ بـه‌ "پاڕانــه‌وه‌" و "به‌ندایه‌تی"یه‌كه‌ی داواكاری هاتنه‌دیی به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشه‌یی و به‌هه‌شتی به‌رینه‌.

بڕوانه‌ ئه‌م پێغه‌مبه‌ره‌ مه‌زنه‌ ﷺ داوای چی ده‌كات؟! ئه‌وه‌تا داوای به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشـه‌یی ده‌كات. ئـه‌م داواكاری‌یه‌شی لـه‌ناو نوێژێكـی وه‌هـا گـه‌وره‌ و گشـتی و په‌رستشـێكی بـه‌رز و هه‌مه‌لایه‌نگیری ئه‌وتۆدایه‌ كه‌ ده‌ڵێی سه‌رجه‌می خه‌ڵكی دوورگه‌ی عه‌ره‌ب و ته‌نانه‌ت تێكڕای گۆی زه‌وی له‌ پشت سه‌ریه‌وه‌ نوێژیان دابه‌ستووه‌ و هه‌مان لالآنه‌وه‌ی ڕه‌نگـین و بـه‌كوڵی ئـه‌و دووپـات ده‌كه‌نـه‌وه‌، چونكـه‌ هـه‌روه‌ك بـه‌هۆی یـه‌كبوونی بناغـه‌كانی ئیمـان لای گشـت پێغه‌مبـه‌ران – درووودیـان له‌سـه‌ر بێـت – نـهێنیی به‌ندایـه‌تیی هـه‌موو ئـه‌و پێغه‌مبه‌رانـه‌ لـه‌ نێــوان به‌ندایه‌تی‌یه‌كه‌ی ئـه‌ودا یــه‌كیان گرتووه‌، بـه‌ هــه‌مان جۆریـش به‌ندایــه‌تیی هــه‌موو كه‌ســانی نه‌ته‌وه‌كه‌یشـی كـه‌ لـه‌ دوای خـۆی هـاتوون و دێـن، تێكـڕا لـه‌ نـاوه‌ندی به‌ندایه‌تی‌یه‌كـه‌ی ئـه‌و پێغه‌مبه‌ره‌دا ﷺ كۆ بوونه‌ته‌وه‌.

كه‌واتـه‌ ئـه‌و پێغه‌مبـه‌ره‌ ئـازیزه‌ ﷺ لـه‌ ڕاستی‌دا ئیمـامی نوێژێكـی تـابڵێی مه‌زنـه‌ و، له‌گـه‌ڵ كه‌سـانێكی یـه‌كجار زۆر و زه‌بـه‌نده‌دا لالآنه‌وه‌یه‌كی تـه‌واو گـه‌رم و بـه‌كوڵ لـه‌ ده‌رگانـه‌ی پـه‌روه‌ردگاری میـهره‌باندا پێشـكه‌ش ده‌كـات. وه‌ك بڵێـی هـه‌موو ئـه‌و كه‌سـانه‌ی كـه‌ نـووری ئیمان ڕووناكیی پێ به‌خشـیون، هـه‌ر لـه‌ سـه‌رده‌می حـه‌زره‌تی ئاده‌مـه‌وه‌ – درووودی لـه‌سـه‌ر

بێت – تا ئێستا و تا ڕۆژی قیامەتیش، جەماعەتیان لە پشت سەریەوە دابەستووە و هەر هەموویان "ئامین" بۆ دوعاکەی ئەو دەڵێن و دووپاتی دەکەنەوە[١].

بڕوانە کە چۆن داواکاری و پێداویستی‌یەکی گشتیی وەك: پێویستیی "مانەوە" و "نەمری" لە خوای گەورەی داوا دەکات! ئەو دوعا و داواکاری‌یەی کە نەك تەنها زەوی نشینان بەڵکو ئەهلی هەموو ئاسمانەکان و تەنانەت گشت بوونەوەرانیش تیای‌دا بەشدارن و تێکڕا بە زمانی حاڵ دەڵێن: "ئامین.. ئامین، ئەی خوای پەروەردگارمان! دوعاکەی گیرا بکە و ئێمەش وەك ئەو لێت دەپاڕێینەوە و هەمان خواست و لالانەوەت پێشکەش دەکەین".

پاشان بۆی بڕوانە! وا بەوپەڕی نەرمونیانی و خەمباری و خۆشەویستی و پێ داگرتن و تاسەمەندی و لالانەوەی بەکوڵ و تکاکاری‌یەوە داوای ئەو مانەوە و بەختەوەری‌یە دەکات، بە چەشنێ کە خەم و پەژارەی سەرانسەری گەردوونیشی هەژاندووە و خستوونیەتە مەراق و گریانەوە و لەگەڵ خۆی‌دا بەشداری ئەو دوعایەی کردوون.

پاشان بە وردی بڕوانە و سەرنج بدە! بزانە کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ لەبەر ئامانج و مەبەستێکی گەلێ بڵند و مەزن داوای ئەو بەختەوەری‌یە هەمیشەیی‌یە دەکات، تاکو مرۆڤ و سەرجەمی بوونەوەران لە خلیسکان و شۆڕ بوونەوەیان ڕووەو پلە نزمەکان – کە نەمان و تیاچوونی موتڵەق و بەزایە چوون و بێهوودەیی‌یە – ڕزگار بکات و بەرەو مەزنترین و بەرزترین پلەی بڵند و باڵایان ببات کە: پایە بڵندی و، مانەوە و، ئەرك گرتنە ئەستۆ و، وەرگرتنی بەرپرسیاری‌یە، تاکو شایستەیی ئەو پلەیە و شەرەفمەندیی پایەی: "نووسراوی صەمەدانی"ی خوای گەورە بەدەست بهێنن.

---

(١) بەڵێ، هەموو ئەو دوعا و نوێژانەی کە لە یەکەم نزا و پاڕانەوەی پێغەمبەرەوە ﷺ تاکو ئێستا و تا دنیاش دنیایە نەتەوەی ئیسلام بە گەرمی ئەنجامی دەدەن.. هەروەها ئەو گشت سڵاوات و سەلامەی کە هەموو یەکێکی ئەم نەتەوەیە ئاراستەی پێغەمبەری خۆشەویستی ﷺ دەکەن.. لە ڕاستی‌دا "ئامین"کردنێکی هەمیشە و بەردەوامن بۆ ئەو دوعا و نزایەی پێغەمبەر ﷺ و بەشداری کردنێکی گشتی و فیعلی‌یە لەو دوعایەی ئەودا، بگرە هەموو دروود و سڵاوێك کە پێشکەشی ئەو دەکرێت، "ئامین" وتنێکە بۆ ئەو دوعایەی پێغەمبەر ﷺ ئنجا گشت ئەو سڵاواتانەی کە یەك بە یەکی نەتەوەکەی لە نوێژەکاندا و لە دوعای دوای قامەتیشدا – لای شوێنکەوتووانی مەزهەبی شافیعی – لە ڕاستی‌دا "ئامین" وتنێکی گشتی‌یە بۆ ئەو نزایەی پێغەمبەر ﷺ کە داوای بەختەوەریی هەمیشەیی پێ دەکات. کەواتە پێغەمبەر ﷺ لە دوعا و نزاکانی‌دا تکای هاتنەدیی مانەوە و بەختەوەریی هەمیشەیی بۆ گرۆی مرۆڤ دەکات. خۆ ئەمەش – لە ڕاستی‌دا – ئەو خواستە دەروونی‌یەی سەرجەمی گرۆی مرۆڤە کە بە هەموو هێزێکیەوە و بە زمانی حاڵی سروشتی داوای دەکات و ئاواتەخوازی هاتنەدیی ئەو هیوا ڕەگ داکوتاوەی ناخی دڵیەتی. لەبەر ئەوە، هەموو ئەو کەسانەی کە نووری ئیمان ڕووناکیی ئاراستە کردوون و ڕۆشنایی پێ بەخشیون، لە پشت سەری ئەو پێش‌نوێژە بەرێزەیانەوە کە پێغەمبەری ئازیزە ﷺ ڕیز ڕیز ڕاوەستاون و تێکڕا "ئامین" بۆ دوعاکانی دەکەن. جا ئایا دەگونجێ ئەم دوعایە قبووڵ و گیرا نەبێت؟! (دانەر)

بڕوانە! چۆن وا بە هاوار و گریان و لالانەوەی بەکوڵ و تکای هەڵقوڵاوی ناخی دڵەوە داوای یارمەتی دەکات، بە ڕادەیەك کە دەڵێی هەموو بوونەوەران، بەڵکو هەموو ئاسمانەکان، تەنانەت عەرشی مەزنی خواوەندیش، بە دەنگی پاڕانەوەکەی ئەو دەزرنگێنەوە و، شەوق و تاسەی هەموو ئەوانەشی بۆ نزاکەی خۆی هەژاندووە و وای لێ کردوون کە ئەوانیش پڕ بە دەم بڵێن: "آمین.. اللّهم آمین"(١).

بڕوانە! ئەوەتا "بەختەوەری" و "مانەوەی هەتاهەتایی" لە زاتێکی بەتوانای بیسەری سەخاوەتمەند و زانای بینەری میهرەبان داوا دەکات، لە کەسێك کە شاراوەترین پێویستیی لاوازترین بەدیهێنراو دەبیستێت و بە میهرەبانیی خۆی فریای دەکەوێت و بەهانایەوە دەڕوات، هەرچەند ئەو دوعا و پاڕانەوەیەشی بە زمانی حاڵ بوو بێت.. بەڵێ، بە دانایی و بەسیرەت بە هانایەوە دەڕوات و بە زاناییش فریای دەکەوێت، ئەمەش لە ڕادەیەکی وەهادایە هیچ گومانێك لەوەدا ناهێڵێت کە ئەو چاودێرییە لە سنوور بەدەر و بێ وێنەیە، تەنها لە

(١) بەڵێ، بە هیچ جۆرێك ناگونجێ پەروەردگاری ئەم جیهانە ئاگاداری هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی ئەو بەندانەی خۆی نەبێت کە دارای پلەی هەرەبەرزی ناو بەدیهاتووانی ئەون، لە کاتێکدا کە –وەك بە چاو دەبینرێت– ئەو پەروەردگارە بەوپەڕی زانیاری و بەسیرەتەوە کاروباری گەردوون ئالوگۆڕ پێ دەکات و بەڕێوەی دەبات.. هەروەها بە هیچ جۆرێك ناگونجێ ئەو پەروەردگارە زانایە لە کاتێکدا کە ئاگاداری هەموو کردار و بانگەوازو نزاکانی ئەم بەندە هەڵبژاردەیەی خۆیەتی، بایەخ بەم دوعا و نزایەی نەدات.. هەروەها هەرگیز ناگونجێ ئەم پەروەردگارە بەتوانا و میهرەبانە ئەو دوعایانە گیرا نەکات، لە کاتێکدا کە هەموو لێبڕان و دەستبەرداری و هەژارییەك لەو بەندەیەی خۆیدا دەبینێت.

بەڵێ، بە هەڵهاتنی نووری ئەم پێغەمبەرە ﷺ باروودۆخی جیهان گۆڕا و، ڕاستی و ماهییەتی مرۆڤ و گەردوون بە نوور و ڕووناکیی ئەو ئاشکرا بوون و پەردەیان لەسەر هەڵماڵرا و دەرکەوت کە: بوونەوەرانی ناو گەردوون چەند نووسراوێکی "صمەدانی"ی خواوەندن بە چەشنێك کە ناوەڕۆکەکانی خوای گەورەیان تێدا دەخوێندرێتەوە و، چەند کارمەند و بوونەوەرێکی بەنرخی پڕ واتای ئەوتۆن کە شایستەی مانەوەن. خۆ گەر ئەو نوورەی ئەو نەبوایە، ئەوا گەردوون لە ژێر تاریکایی وەهم و گومانە هەڵەکاندا دەمایەوە و، بە نەمان و لەناوچوونی هەتاهەتایی مەحکووم دەکرا و، بێ واتا و سوود و بایەخ دەردەچوو، بگرە دەبووە گاڵتەجاڕ و زادەی دەستی ڕێکەوت. هەر لەبەر ئەم نهێنییەشە کە هەرچی شت هەیە –چ لە زەوی و چ لە ئاسمانەکاندا– لە ڕووناکیی نووری ئەو پێغەمبەرە ﷺ بەهرەمەند دەبن و، بەو چەشنەی کە گرۆی مرۆڤ "ئامین"یان بۆ دوعاکەی ئەو پێشەوا و ڕابەرەیان کرد، ئەوانیش بە هەمان جۆر پەیوەندیی خۆیانی پێوە دەردەخەن. ئەمەیشت بەلاوە سەیر نەبێت، چونکە کاکڵە و ناوەڕۆکی بەندایەتیی پێغەمبەر ﷺ تەنها دوعا و نزا و لالانەوەیە. بگرە گشت جموجووڵ و کار و فرمانەکانی گەردوونیش جۆرێکی تایبەتین لە دوعاکردن، بۆ نموونە: گەشە کردنی "تۆو" لەناو خاکدا و ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەریدا دێن، لە ڕاستیدا جۆرە دوعایەکە کە ئەو تۆوە دەری دەبڕێت و لە بەدیهێنەری دەپاڕێتەوە تا بیکات بە درەختێکی بەرجەستەی باڵابەرزی مەزن. (دانەر)

لایەن یەکێکی بیسەر و بینەرەوەیە و، ئەو کارسازی و ڕێکخستنە وردەش تەنها هی یەکێکی کەریمی میهرەبانە.

بەڵێ، ئەم پێغەمبەرەی کە مایەی شەرەفمەندیی گرۆی مرۆڤ و شانازیی سەرجەمی بوونەوەرانە و تاقانەی بێ وێنەی گەردوون و زەمانە و، پێشەوا و سەرقافڵەی گشت حەشاماتی نەوەی ئادەمە و پێشیان کەوتووە و بەرەو عەرشی ئەعزەم بردوونی و لەوێ دەستەکانی بەرز کردووەتەوە و بە دوعا و نزایەکی گشتی و بەکوڵی حەقیقەتی بەندایەتیی ئەحمەدی - کە پوختەی بەندایەتیی مرۆڤایەتی‌یە - دەلالێتەوە.. ئایا ئەم پێغەمبەرە مەزنە ﷺ چیی دەوێ و لە پاڕانەوەکەی‌دا چی دەفەرموێت؟.. دەبا گوێی لێ ڕابگرین.. ئەوەتا داوای بەختەوەریی هەمیشەیی و مانەوەی هەتاهەتایی ناو خانەی نەمری بۆ خۆی و نەتەوەکەی دەکات.. داوای بەهەشت و نیعمەتەکانی ناو بەهەشت دەکات.. بەڵێ، ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ لەگەڵ ناوە جوانەکانی خوای گەورەدا، کە بەو جوانی‌یەیان لەناو ئاوێنەی بوونەوەراندا دەدرەوشێنەوە، داوای ئەو بەهەشتە دەکات و، ئەو ناوانەش دەکاتە هاودەم و تکاکاری داوا و لاڵانەوەکەی.

ئایا گەر هیچ کام لەو هۆکارە خوازیار و زۆر و زەبەندە و لە ژمارە بەدەرانەی هاتنی قیامەتیش لە کایەدا نەبن، هەر تەنها یەك دوعا و لاڵانەوەی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ سەروزیادی هێنانەدیی بەهەشت نی‌یە؟! کە ئەمەش کارێکە بە ئەندازەی ئاسانیی ژیاندنەوەی زەوی لە وەرزی بەهاردا بە لای بەدیهێنەری میهرەبانەوە سووك و ئاسانە[1]؟

بەڵێ، ئەو کەسەی کە ڕووی زەویی لە بەهاردا کردووە بە نموونەیەکی بەرجەستە لەسەر هاتنەدیی حەشر و، بە توانستی ڕەهای خۆیشی سەدان نموونەی ئەو حەشرەی لە وەرزی بەهاردا بەدی هێناوە و پێش‌چاوی خستوون.. ئەو کەسە، بەدیهێنانی بەهەشتی چۆن بەلاوە کارێکی گران دەبێت؟

---

(١) بەڵێ، دەرخستن و پیشاندانی نموونە ورد و ناوازە و لەژمارەبەدەرەکانی سەر ڕووی ئەو زەوی‌یەی کە لەچاو جیهانی فراوانی دواڕۆژدا لە حوکمی یەك لاپەڕەدایە.. هەروەها پیشاندانی نموونەکانی حەشر و قیامەت لە سێ سەد هەزار بەدیهاتووی هاوسەنگ و ڕێسادارردا.. نووسینی هەموویان بەو ڕێسا ناوازەیە لەسەر ئەو تاقە لاپەڕەیەی ڕووی زەوی‌دا.. بێ گومان ئەم کارە، گەلێ سەخت و ئاڵۆزترە لە چاو ئامادە کردنی ئەو بەهەشتە مەزن و بەرزەی جیهانی فراوانی هەمیشەیی‌دا. لەبەر ئەوە، دەتوانرێ بوترێت: باخچەکانی بەهار، بە ڕێحانە و گوڵزارەکانیانەوە، گەلێ لە بەهەشت زیاتر - بەڵکو بە ڕێژەی بەرزیی پلە و پایەی بەهەشت بەسەر بەهاردا - سەرنجی سەرسامی و هەستی سەرسووڕمان لە لای مرۆڤ دەورووژێنن! (دانەر)

كه‌واته هه‌روه‌ك "پێغه‌مبه‌رایه‌تی"یه‌كه‌ی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره خۆشه‌ویسته ﷺ بوو به‌هۆی دروستكردن و به‌دیهێنانی ئه‌م خانه‌ی تاقیكردنه‌وه‌یه‌ی دنیا و ڕوونكردنه‌وه‌ی نهێنیی: "لـولاكَ لولاكَ لَمَا خَلَقْـتُ الأفـلاكَ"[1].. "به‌ندایه‌تی"یه‌كه‌یشی بووه به‌هۆی به‌دیهێنانی خانه‌ی به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشه‌یی ئه‌ودنیا..

جا ئایا ده‌گونجێ ئه‌م ڕێكوپێكی‌یه ناوازه‌یه‌ی جیهان كـه ژیری‌یه‌كانی مه‌ست و سه‌رسام كردووه و..

ئه‌و سنعه‌ته وردانه‌ی خواوه‌ند و..

جوانیی په‌روه‌ردگارێتی‌یه هه‌مه‌لایه‌نه‌كه‌ی و.. میهره‌بانی‌یه فراوانه‌كه‌ی..

به گیرا نه‌كردنی دوعا و لالانه‌وه‌كه‌ی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره خۆشه‌ویسته، به ئاكامێكی وه‌ك: ناشیرینی و، سته‌می یه‌كجار سه‌خت و، فه‌وزا و، به‌ربادیی سه‌رانسه‌ری و بێ سنوور، ڕازی بێ كه ئه‌نجامێكی حه‌تمی و بێ‌گومانی ئه‌و گیرا نه‌كردنه‌یه؟

واته چاودێریی گـرنگترین و پێویسـترین خواسـت و ئـاره‌زوو نـه‌كات و گوێـی لـێ نه‌گرێت و نه‌یهێنێته‌دی؟ له كاتێكدا كه به‌وپه‌ڕی بایه‌خ پێدانه‌وه چاودێریی ساده‌ترین و بچووكترین ئاره‌زوو ده‌كات و، كزترین و نزمترین ده‌نگ ده‌بیستێت و، پێداویستیی هه‌موو كه‌سێكی موحتاجیش جێبه‌جێ ده‌كات؟

نه‌خێر.. هه‌زار هه‌زار جار نه‌خێر.. جوانیی ئاوا، هه‌رگیز به ناشیرین كردن و ئالۆزاندن ڕازی نابێت و نایه‌وێ له‌كه‌ی ناشیرینیی به‌ر بكه‌وێت[2].

---

(١) له‌سه‌ر "لولاك.. لولاك" زانایان زۆریان وتووه، چ له باره‌ی سه‌نه‌ده‌وه، چ له باره‌ی واتاكه‌یه‌وه. له هه‌مووی جوانتر وته‌كه‌ی (علي القاري)یه له شه‌رحی "شیفا"دا، كه ده‌ڵێت: "هه‌رچه‌ند له سه‌نه‌ددا لاوازه، به‌ڵام واتاكه‌ی ڕاسته". بڕوانه: (شرح الشفا لعلي القاري ١/٦).. بۆ زانینی ئه‌وه‌ش كه ئه‌م وته‌یه واتاكه‌ی ڕاسته و خوای گه‌وره له‌به‌ر پێغه‌مبه‌ر ﷺ گه‌ردوونی دروست كردووه، بڕوانه: (الفتـاوى - لابـن تيميـة ج١١ ص٩٦-٩٨، مجلـد التصوّف). (وه‌رگێڕ – له چاپه عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌وه)

(٢) به‌ڵێ، هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه و سه‌ره‌ونخوون بوونی ڕاستی‌یه‌كان كارێكی مه‌حاڵه، له هه‌موویان مه‌حاڵتریش ئه‌وه‌یه كه ئه‌و ڕاستی‌یه هه‌ڵبگه‌ڕێته‌وه و ببێت به شتێكی پێچه‌وانه‌ی خۆی! ئنجا له نێوان ئه‌م حه‌قیقه‌تی: "نه‌گونجاویی هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ی ڕاستی"یه‌شدا ڕاستی‌یه‌ك هه‌یه كه هه‌رگیز به دژه‌كه‌ی خۆی ڕازی نابێت، كه ئه‌ویش بریتی‌یه له‌وه‌ی: ئه‌و شته – له‌گه‌ڵ مانه‌وه‌ی ماهییه‌ته‌كه‌ی خۆیشی‌دا – هه‌ڵبگه‌ڕێته‌وه و ببێت به شتی پێچه‌وانه و دژی خۆی! وه‌ك ئه‌وه‌ی جوانیی ڕه‌ها – هاوده‌م له‌گه‌ڵ مانه‌وه و پارێزگاری كردنی ئه‌م جوانی‌یه‌شی‌دا – ببێت به ناشیرینیی ڕاسته‌قینه! به‌م پێیه، جوانیی ڕوون و ئاشكرای په‌روه‌ردگارێتیی خوای گه‌وره، له‌گه‌ڵ مانه‌وه‌ی ئه‌م ماهییه‌ته‌ی‌دا، هه‌ڵبگه‌ڕێته‌وه و ببێت به شتێكی دژی خۆی! ئه‌م جۆره‌یان، به لای بڕیاری عه‌قڵه‌وه، له هه‌موو مه‌حاڵێك مه‌حاڵتر و به‌تاڵتره. (دانه‌ر)

کەواتـە، ئـەم پێغەمبـەرە ﷺ هـــەروەك بـە "پێغەمبەرایــەتی"یەکـەی دەرگـای دنیـای کردووەتەوە.. بـە "بەندایـەتی"یەکەیشـی بـۆ خـوای گـەورە، دەرگـای ئـەو دنیـای خستووەتە سەرپشت.

عليه صلوات الرحـــمن ملء الدنيا ودارالجنان.

اللّهم صلِّ وسلّم على عبدكِ ورسولك، ذلك الحبيب الذي هو سيّدُ الكونَـــين، وفخــرُ العالمَين، وحياةُ الدّارَين، ووسيلةُ السّعادتَين، وذوالجناحَين، ورسولُ الثقلَـــين، وعلَـــى آلـــهِ وصحبهِ أجـــمعين، وعلى إخوانهِ من النبيين والمرسلين.

آمين.

## ڕاستیی شەشەم

### دەرگای: "مەزنی" و "هەمیشەیی"

### کە درەوشانەوەی ناوی: "الجليل" و "الباقي"ی خوای گەورەیە

ئایا دەگونجێ پەروەردگارێکی مەزنی ئەوتۆ کـە گشـت بوونـەوەران هـەر لـە خۆرەکـان و ئەستێرە زەبەلاحەکانەوە تا دەگاتە درەختەکان و گەردیلەکان، تەنانەت لەوان بچووکـتریش، چەشنی بەڕێوەبردنی سوپا، بەڕێوە ببات و لـە کـار و ئـەرك و فەرمانبـەریی ئەستۆیاندا بیانخاتـە گـەڕ.. پـەروەردگارێکی ئـاوا مـەزن، دەسـتەڵاتی خــۆی تەنـها بەسـەر ئـەو هـەزارە فـانی و لەناوچووانەدا بنوێنێت کە ژیانێکی کەم و کاتی لەم میوانخانەیەی دنیادا بەسەر دەبەن و، ئیـتر مەڵبەندێکی بەرز و هەمیشـەیی و خانەیەکی هەتاهەتایی ئەوتۆ دروسـت نـەکات کـە شـایان و شایستە و خولگەی پەروەردگارێتیی مەزنی خۆی بێت؟!

خۆ ئەو شتانەی ئێمە لە گەردووندا دەیانبینین، چەشنی:

ئەو کار ڕاییکردنە هەرە مەزنانەی کە لە گۆڕینی وەرزەکاندان و..

دەستکاری و هەڵسوکەوتە گەورەکانی وێنەی: بەگەڕخستنی ئەستێرەکان و..

ژێربارخستن و ڕامکردنی سەرسووڕهێنەرانەی چەشـنی: بـەکارهێنانی "زەوی" بـە وێنـەی لانك و "خۆر"یش لە شێوەی چرادا و..

ئاڵوگۆڕە فراوانـەکانی وەك: زینـدوو کردنـەوە و ئارایشـتدانی زەوی، لـە دوای مـردن و وشك بوونی..

هەموو ئەم کـارە مەزنانـە، بـە ڕوونـی بۆمـان دەردەخـەن کـە پەروەردگارێتی‌یـەکی گەلـێ مەزن لـە پشت پەردەی ئەو کاروبارانەوە هەیە و، بەو دەستەڵاتە مەزنەی خـۆی بەسـەر هـەموو ئەوانەدا زاڵ و فەرمانڕەوایە.

جا دەستەڵاتداریی پەروەردگاری‌یانەی ئاوا مەزن - بێ هیچ گومانێك - داخوازی بوونی ڕەعیەتگەلێكی وەهایە كە شیاوی مەزنیی ئەو بن و، داواكاری چەند ئاوێنەیەكی ڕەنگدەرەوەی گونجاوی ئەوتۆیە كە ئەو دەستەڵاتە گەورەیەیان تێدا دەربكەوێت. كەچی دەبینین: ئەو ڕەعیەت و بەندانەی كە لە هەموان زیاتر تایبەتكاریی ئاوا شیاویان تێدا جەم بووە، لەم میوانخانەیەی دنیادا بە "ماندوویی" و "بەجۆرێكی كاتی" كۆ بوونەتەوە.. خودی میوانخانەكەش ڕۆژانە پڕ دەكرێت و خاڵییش دەكرێتەوە و.. ڕەعیەتەكانیش تەنها بە ئەندازەی ماوەی ئەنجامدانی تاقیكردنەوە و ئەركی سەرشانیان نەبێ، زیاتر لەم گۆڕەپانی تاقیكردنەوەیەدا نامێننەوە.. تەنانەت خودی گۆڕەپانەكەش هەموو سەعاتێك ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت! كەواتە ئەو بەندە و ڕەعیەتانەی ئێستا لێرەدان، تەنها چەند خولەكێكی دیاری كراو (بۆ مەبەستی بینینی نموونەی نیعمەتە بەنرخەكانی بەدیهێنەری شكۆمەندیان) لەم پیشانگایانەی بازاڕی جیهاندا، ڕادەوەستن و.. بۆ ئامانجی بازرگانیش - لەم پیشانگا مەزنەدا - تەنها سەیرێكی سنعەتە ناوازەكانی خواوەند دەكەن و، پاشان دەڕۆن و لە بەرچاودا ون دەبن. بگرە خودی پیشانگاكەش لە هەموو خولەكێكدا دەگۆڕێت و وەك باری پێشووی نامێنێت، ئەوەتا هەركەسێك دەڕوات ناگەڕێتەوە و ئەوەش كە تازە دێتە ناوی وەك ئەوەی پێشوو كۆچ دەكات.

ئەم بارە سەرسووڕهێنەرە، بە ئاشكرا و بە چەشنێكی گومانبڕ، دەریدەخات كە لە پشتی ئەم میوانخانە فانی‌یە و پاش ئەم گۆڕەپان و پیشانگا هەمیشە ئاڵوگۆڕبوانە، چەندین كۆشك و تەلاری شایانی ئەو دەستەڵاتداری‌یە هەمیشەیی‌یە و.. چەندەها خانە و لانەی ناو چەندین باخچەی ڕەنگین و.. چەندان گەنجینەی پڕاوپڕ لە: ئەسڵە ڕاستەقینە و بێ گەردەكانی ئەو نموونانەی لەم دنیایەدا دەیانبینین، بۆ ئەو ڕەعیەتانە ئامادە كراون. كەواتە هەوڵ و كۆششی ئێرە بۆ بەدەستهێنانی ئەوانەی ئەوێیە و، كارمەندی و ئیش كردنی ئێرەش بۆ وەرگرتنی پاداشتەكەیەتی لەوێ. واتە: هەموو كەسێك بەپێی لێهاتنی و بە گوێرەی تەقالادانی ئێرەی، بەختەوەری‌یەكی فراوانی لەوێ دەست دەكەوێت.. گەر نەیدۆڕێنێت!

بەڵێ، مەحاڵە ئەم چەشنە پەروەردگاری‌یە مەزن و هەمیشەیی‌یە، تەنها بۆ ئەو ڕەعیەتە فانی و زەلیل و هەژارانە هاتبێتە كایەوە.

فەرموو، لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە، بۆ ئەم ڕاستی‌یە بڕوانە:

وا دابنێ بە ڕێگایەكدا دەڕۆیت و، میوانخانە(ئوتێل)ێكی گەورە دەبینیت كە پادشایەكی مەزن لەو سەرەڕێیەدا بۆ میوانەكانی بنیاتی نابێت و پارەوپوولێكی گەلێ زۆریشی لە ڕازاندنەوە و ئارایشتدانی‌دا خەرج كردبێت، تاكو شادمانی و خۆشی بە دڵی میوانەكانی

بەخشێت و ئەوانیش پەند و ئامۆژگاری لەو شتانە وەربگرن کە لە میوانخانەکەدا دەیانبینن.. بەڵام ئەو میوانانەی کە دێنە ناوی هەندێکی یەکجار کەمی ئەو ئارایشتانە نەبێ هیچی تری لێ نابینن و بەشێکی تابلێی کەمی ئەو نیعمەتانە بەولاوە هیچیتریان لێ ناچێژن، چونکە ماوەیەکی کەم تیایدا دەمێننەوە و پاشان میوانخانەکە بەجێ دەهێڵن، بێ ئەوەی بە کامی دڵ تێر ببن و تاسە و تینوێتییان لێی بشکێت، جگە لە وێنەگرتنی شتانی ناو میوانخانەکە نەبێ کە بە کامێرایەك وێنەیان دەگرن. خزمەتکار و کارگوزارانی خاوەنی میوانخانەکەش هەمان کار ئەنجام دەدەن، چونکە بە وردی و ئەمانەت وێنەی هەموو وەستان و جموجوولێکی میوانەکان دەگرن و تۆماریان دەکەن. پاشان دەبینیت کە هەرچی ڕۆژە پادشا زۆربەی ئارایشت و ڕازاندنەوە بەنرخەکان دەڕووخێنێت و نموونەی نوێ بۆ میوانە تازە هاتووەکانی لە جێیاندا دادەنێت.. ئایا - دوای ئەمە - هیچ گومانێکت لەوەدا دەمێنێت کە ئەو کەسەی ئەم میوانخانەیەی لەم سەرەڕێیەدا بنیات ناوە، خاوەنی چەندین کۆشك و تەلاری بەرز و گەنجینەی پڕاوپڕی بەنرخی نەبڕاوەیە و دارای سەخاوەتێکی هەمیشەیی بێ کۆتاییە و، ئەم بەخشندەیی و سەخاوەتەش کە لەم میوانخانەیەدا پێشچاوی دەخات تەنها لەبەر بزواندنی ئیشتیهای میوانەکانیەتی بۆ شتانی لای خۆی و، بۆ مەبەستی بێدار کردنەوە و جووڵاندنی خواست و ئارەزووی ئەوانە بۆ ئەو دیارییانەی کە لای خۆی بۆی ئامادە کردوون؟

جا ئەگەر لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە سەرنجی بارودۆخی ئەم میوانخانەیەی دنیا بدەیت و، بە وردی و وریایی تەواو بۆی بڕوانیت، ئەوا بە باشی لەم "نۆ" بناغەیەی خوارەوە تێدەگەیت:

بناغەی یەکەم:

تێدەگەیت کە ئەم دنیایەی وا لە میوانخانە دەچێت، خۆی هی خۆی نییە، چونکە کارێکی مەحاڵە کە هەر خۆی لە خۆیدا ئەم شێوە و شکڵەی گرتبێتە خۆ، بەڵکو لە ڕاستیدا میوانخانەیەکە لەم سەرەڕێیەدا بۆ کاروانی بوونەوەران بە "دانایی" بنیات نراوە و، هەردەم پڕدەکرێت و پاشان چۆڵ دەبێت.. مەنزڵگایەکی سەرەڕێیە بۆ لادان و حەوانەوە.. پاشان کۆچ کردن.

بناغەی دووهەم:

هەروەها تێدەگەیت کە: دانیشتووانی ئەم میوانخانەیە، میوان و کۆچەرین و، پەروەردگارە بەخشندەکەشیان بۆ خانەی حەوانەوە و ئاسوودەیی دەعوەتیان دەکات.

بناغەی سێ‌هەم:

هەروەها تێ‌دەگەیت کە: ڕازاندنەوە و ئارایشتەکانی ئەم دنیایە، تەنـها بـۆ لـەزەت لـێبردن نی‌یە، چونکە گەر یەك سەعات لەزەتت لە دنیادا پێ بچێژن دوایی چەندەها سـەعات ئـازاری لێکبڕان و جودابیـت دەرخـوارد دەدەن. ئەوەتا چ لەبـەر کـەم تەمـەنیی ئـەو یـان لەبـەر تەمـەن کورتیی خۆت، تامی ئەو لەزەتانەت لەو ماوە کەمەدا لەبەر ئەوە پێ دەچێژرێت کە ئیشتیهات بجوولێنن، نەك تێریـان لـێ بخۆیـت. چونکـە بڕ و ئـەندازەی ئـەو لـەزەتانـەی ئـێرە، توانـای تـێر کردنی تۆیان نی‌یە. کەواتە ئەم ئارایشتە بەنرخـە کـەم تەمەنـە، بۆ دەرس و پـەند وەرگرتـن[1] و شـوکرانەبژێری و هاندانی تام چەشـتوانیەتی تاکو ئەسـڵە هەمیشەیی‌یەکەی دەستی خۆیـان بخەن و پێی بەهرەمەند ببن.. هەروەها بۆ چەندین مەبەستی تری بەرزە.

بناغەی چوارەم:

هـەروەها تێ‌دەگـەیت کـە: ئـەم ئارایشـتەی دنیـا[2] چـەند وێنـە و نموونەیـەکی نیعمەتـە

---

(١) هەرچەندە گشت دروستکراوێکی ورد و خاوەن نەخشەی ناوازە و پێکهاتنی جوان و ڕەنگین، گەلـێ بـەنرخ و گرانە.. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنەکەی یەکجار کورتە و بوونەکەیشی کاتێکی کەم دەخایەنێت. کەواتە ئەوانـە لە ڕاستی‌دا تەنها نموونە و وێنەی چەند شتێکی ترن. جا لەبەر ئەوەی لەمانـەدا شتێکی ئەوتۆ هەیـە کـە لـەوە بچێت سەرنج بۆ لای حەقیقەتە ئەسڵی‌یەکان ڕابکێشێت، ئەوا بەلاتەوە کارێکی سەیر و نامۆ نەبێت گەر بوتـرێ: ئارایشتی ژیانی دنیا تەنها بۆ ئەوەیە کە چەند نموونەیەك بن بۆ نیعمەتەکانی بەهەشت، لەوانەی کـە پـەروەردگاری میـهرەبان بـە چاکە و لوتفی خۆی بۆ بەندە خۆشەویستەکانی ئامادەی کردوون، بگرە حەقیقەت هەر تەنها ئەمەیە. (دانەر)

(٢) بەڵێ، بۆ "بـوون"ی هـەر شتێك چـەندین مەبەست و، بۆ "ژیـان"یشی چـەندەها ئامـانج هەیـە. ئـەو ئامـانج و مەبەستانەش تەنها ئەوانە نین – وەك گومڕایان گومان دەبەن – کە ڕوویان لە دنیا و خـودی بوونەوەرەکە خۆیـەتی تا بێ‌مەبەستی و هەڕەمەکیی جێی خۆیـان لـە نێوانیـاندا بکەنـەوە، بەڵکو ئامـانج و مەبەستەکانی "بـوون" و "ژیـان"ی هەموو شتێك دەبن بە سێ بەشەوە:

یەکەمیان: کە لـە هـەموویان بـەرزترە، ڕووی لـە بەدیهێنـەری مەزنیـەتی. واتـە: پیشـاندانی دروسـتکردن و وردەکاری و ناوازەیی پێکهاتنی هەموو شتێك لە بەرچاوی بینەری ئەزەلی‌دا بە چەشنی نمایشی ڕەسمیـی سـەربازی. جا بۆ ئەم مەبەستی بینینەی خوای گەورە، ژیانی ئەو شتە – با چرکەیەکیش بێت – سەروزیادە، تەنانەت هەندێ جار هەر تەنها ئامادەبوونی ئەو شتە بۆ دەرخستـنی هێزە پەنامەکی‌یـەکانی، کـە هێشتا نەهاتوونەتـە جیـهانی بـوون و وەك نییـەتی ئـەو شتە وان، سـەروزیادی هاتـنەدیی ئـەم مەبەسـت و ئامانجەیە. نموونـەی ئەمـە وەك ئـەو بوونەوەرانـەی کـە بەخێرایی دێن و دەڕۆن و، چەشنی ئەو "تۆو"انەی کە بۆیان نەڕەخسا گوڵ و بەرەکانیان ببەخشن، هەموو ئەمانە، ئەم ئامانج و مەبەستەمان بۆ دەردەخەن. کەواتـە هـەرگیز بێ‌مەبەسـتی و بێ‌سوودی لـە دروسـتبوونی هیـچ کـام لەوانـەدا نی‌یە. واتە: یەکەم ئامانجی بوونی هەموو شـتێك ئـەوەیە کـە بـە "بـوون" و "ژیـان"ەکـەی، مـوعجیزاتی توانسـت و ئاسەوار و جێ دەستی بەدیهێنەری خۆی لە بەردەم بینینی چاودێریی خاوەن و پادشای شکۆمەندی‌دا دەربخات.

بەشی دووهەمی ئامانجی "بوون" و مەبەستی "ژیان": ڕووەو خاوەن هەست و شعوورەکان دەڕوانێت. واتە: هەر شتێك دێتە جیهانی بوون، لە ڕاستی‌دا نامەیەکی پڕ لە حەقیقـەت و پارچـە هۆنراوەیـەکی ناسك و نیـان و وشـەیەکی حیکمەت بەخشی پەروەردگارە، کە بەدیهێنەری مەزن لە بەرچاوی مەلائیکەت و جیننی و ئـاژەڵ و مرۆڤـدا پیشـانی

پاشەکەوت کراوەکانی میهرەبانیی خوای گەورەن کە لە بەهەشتدا بۆ ئیمانداران پاشەکەوت کردوون.

بناغەی پێنجەم:

هەروەها تێدەگەیت کە: ئەم دروستکراوە فانییانە بۆ فەنا و لەناوچوون دروست نەکراون و، بۆ ئەوەش بەدی نەهێنراون کە تاوێك ببینرێن و پاشان هەروا بە مفتە و خۆڕایی بڕۆن و لەناو بچن، بەڵکو لێرەدا کۆ کراونەتەوە و بۆ ماوەیەکی کەم جێی پێویستی خۆیان

---

دەدات، تاکو ئەوانە سەرنجی تێرامانی ئاراستە بکەن. واتە: هەموو شتێك جێی سەرنجدان و خوێندنەوە و پەند لێ وەرگرتنە بۆ هەر خاوەن هەست و شعوورێك بۆی بڕوانێت.

بەشی سێهەمی ئامانجی "بوون" و مەبەستی "ژیان": ڕووەو خودی ئەو شتە دەڕوانێت. وەك: لەزەت چەشتن و، خۆش ڕابواردن و، ژیان بەسەر بردن بە شادی و کامەرانی و، غەیری ئەمانەش لە ئامانج و مەبەستە هەندەکییەکان. بۆ نموونە: سوودێکی بەرهەمی کاری کەشتیوان لە کەشتیی مەزنی پادشادا بۆ خۆی دەگەڕێتەوە کە بریتییە لە کرێی کارەکەی. کەچی ئەم سوودەی کە بەم دەگات یەك لە سەدی بەرهەمەکانی ئەو کەشتییە مەزنەیە، بەڵام نەوەد و نۆ بەرهەمەکانی تری دەگەڕێنەوە بۆ خاوەنەکەی کە پادشایە. بەم جۆرە، دەرکەوت کە ئەگەر ئەو ئامانج و سوودەی لە هەر شتێکدا هەیە و بۆ خودی خۆی و دنیاکەی دەگەڕێتەوە بریتی بێت لە یەك ئامانج و سوود، ئەوا نەوەد و نۆ مەبەست و ئامانجی بۆ بەدیهێنەری مەزنی دەگەڕێتەوە. کەواتە لە زۆرو زەبەندەیی ئەم ئامانجانەدا دەتوانرێت "دانایی"و "بەخشندەیی" بە جیا جیا ببینرێن، واتە جیاوازیی نێوان: "دەستپێوەگرتنی ڕەها" و "سەخاوەتی ڕەها" بزانرێت کە بە ڕواڵەت وەك دوو شتی پێچەوانە و دژی یەکتر دێنە بەرچاو. وا ئەم مەبەستە بەمەی خوارەوە ڕوون دەکەینەوە:

گەر لە دروستبوونی بوونەوەراندا تەنها یەك مەبەست و ئامانج ڕەچاو بکرێت، ئەوا ئەو کاتە تەنها "بەخشندەیی" و "سەخاوەت" زاڵ دەبن و، ناوی: "الجواد"ی خوای گەورە دەردەکەوێت و دەدرەوشێتەوە. بۆ نموونە و بەپێی ئەو تەنها ئامانجە ڕەچاو کراوە: بەروبووم و دەغڵ و دانەکان تابڵێی زۆر و لەژمارەبەدەرن. واتە زۆرییەکەیان بەخشندەیی و سەخاوەتێکی ڕەها دەگەیەنن. بەڵام ئەگەر هەموو مەبەست و ئامانجەکان پێکەوە ڕەچاو بکرێن، ئەوا "دانایی" دەردەکەوێت و زیاتر زاڵ دەبێت و، ناوی "الحکیم"ی خوای گەورە پتر دەدرەوشێتەوە. ئەو کاتەش ژمارەی حیکمەت و ئامانجە پێویستەکانی تاقە بەرێکی تەنها یەك درەخت بە ئەندازەی ژمارەی بەرەکانی ئەو درەختە دەبن و، ئیتر ئەم ئامانج و مەبەستانە بەسەر هەر سێ بەشە ناوبراوەکاندا دابەش دەبن. جا ئەم مەبەست و ئامانجە گشتییانە ئاماژە بۆ داناییەکی بێ کۆتایی و دەستپێوەگرتن(إقتصاد)ێکی بێ سنوور دەکەن، ئەو کاتەش "دانایی ڕەها" لەگەڵ "بەخشندەیی و سەخاوەتی ڕەها"دا کۆ دەبنەوە کە بە ڕواڵەت وەك دژی یەکتر دەردەکەون. بۆ نموونە: یەکێك لە ئامانجەکانی بوونی سوپا پارێزگاری کردنی ڕێسا و ئاسایشە. خۆ ئەگەر تەنها لەم گۆشەیەوە سەیری سوپا بکرێت، دەبینرێت ژمارەی سوپا زیاد لە پێویستە. بەڵام گەر لەگەڵ ئەو مەبەستەدا ئامانجەکانی تری بوونی سوپا ڕەچاو بکرێت، وەك: پاراستنی سنوور و، جیهاد کردنی دوژمنان و، جگە لەمانەش لەو ئامانجە گشتییانە، ئەوا دەردەکەوێت کە ژمارەی سوپا لەوانەیە سەروزیاد بێت. کەواتە لە ڕەچاو کردنی گشت ئامانجەکاندا هاوسەنگییەك دەبینرێت کە بە تەرازووی "دانایی" ڕاگیر کراوە. ئەو کاتە "حیکمەت" و "مەزنی"ی حکوومەت پێکەوە کۆ دەبنەوە. بەم جۆرە، لەم حاڵەتەدا دەتوانرێت بوترێت: ژمارەی سوپا زیاد لە پێویست نییە. (دانەر)

گرتووە تاکو وێنەیان بگیرێت و واتاکانیان ڕابگەیەنن و ئەنجامەکانیان بنووسرێن و، چەندین دیمەنی هەمیشەیی ئەمانی فانی بۆ دانیشتووانی هەمیشەیی بەهەشت ئامادە بکرێن و.. بۆ چەندین مەبەست و ئامانجی تری جیهانی مانەوە و هەتاهەتایی.

لەم نموونەیەی خوارەوە تێدەگەین کە چۆن شتان بۆ مانەوە بەدی هێنراون نەك نەمان، بەڵکو نەمانە ڕواڵەتییەکەیان تەنها بریتییە لە: کار تەواو کردن و، سەربەست بوون و، حەوانەوە.. هەروەها تێدەگەین لەوەیش کە چۆن ئەو شتە لە ڕوویەکەوە تیادەچێت، بەڵام لە چەندەها ڕووی ترەوە دەمێنێتەوە:

سەرنج لەم گوڵە بدە کە یەکێکە لە وشەکانی توانستی خوای بەدیهێنەر. ئەوەتا ئەم گوڵە جوانە ماوەیەکی گەلێ کەم بە خەندە و شادییەوە بۆمان دەڕوانێت، چونکە پاش ئەو ماوە کەمەی تەمەنی، لە پشت پەردە و ئاسۆی نەمانەوە ئاوا دەبێت. ئەم گوڵە - لە ڕاستیدا - وەك ئەو وشەیە وایە کە لە زارمان دەردەچێت و، پاش وتنی، هەزاران دانە وشەی لەبەرگیراوەی خۆی لە گوێی خەڵکیدا دادەنێت و، دوای ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیشی بە ئەندازەی ژمارەی ئەو عەقڵانەی گوێیان لێی بووە، واتا و ناوەڕۆك بەجێ دەهێڵێت.

بەڵێ، هەروەك ئەو وشەیە ئاوەهایە، ئەم گوڵەش بە هەمان جۆرە، دوای ئەوەی کە وێنە ڕواڵەتییەکەی لە "بیر"ی گشت ئەو کەسانەدا بەجێ دەهێڵێت کە دیویانە و پاش دانانی ماهییەتە مەعنەوییەکەی لە تۆوە یەکجار بچووکەکانیدا، کۆچی ماڵئاوایی لەم جیهانە دەکات. وەك بڵێی هەموو "بیر" و "تۆو"ێك لەوانەی باس کران، لە شێوەی وێنەیەکی فۆتۆگرافیدا بن بۆ مەبەستی پاراستنی جوانی و ڕازاوەیی شێوەی ئەو گوڵە و، جێگایەك بن بۆ بەردەوامبوونی مانەوەی.

جا ئەگەر ئەم دروستکراوەی کە لە نزمترینی پلەکانی ژیاندایە، ئا بەم چەشنە مامەڵەی مانەوەی لەگەڵدا بکرێت، دەبێ مامەڵەی مرۆڤ چۆن بێ کە لە بەرزترینی چینەکانی ژیاندایە و خاوەنی ڕۆحێکی هەمیشەییە؟ ئایا ئەم مرۆڤە وابەستەی مانەوە و هەمیشەیی نابێت؟ خۆ ئەگەر "وێنە"ی ڕووەکی گوڵداری بەردار و، "یاسا"ی پێکهاتنی - کە تا ڕادەیەك وەك ڕۆح وایە - ئاوا بمێنێتەوە و لە نێوان ئەو هەموو ئاڵوگۆڕە زۆرانەدا بەوپەڕی ڕێکوپێکی لە تۆوەکانیدا بپارێزرێت، دەبێ ڕۆحی مرۆڤ چەندە دارای مانەوە و وابەستەی هەمیشەیی و هەتاهەتایی بێت؟ لە کاتێکدا کە - ئەم ڕۆحە - یاسایەکی "ئەمری"ی خاوەن هەست و شعوور و نوورانییە و، خاوەنی ماهییەتێکی پێشکەوتووە و، دارای ژیان و چەند

تایبەتکاریيەكی گشتی و هەمەلایەنەیە و، بوونی دەرەكی(وجوودی خاریجی)یشی لەبەر كراوە؟!

بناغەی شەشەم:

هەروەها تێدەگەیت كە مرۆڤ جڵەوی بۆ بەرەڵا نەكراوە تا چۆن و لە كوێدا دەیەوێت بە سەربەستی ڕابوێرێت. بەڵكو كردارەكانی لەسەر تۆمار دەكرێن و وێنەیان دەگیرێن و، هەرچی دەكات دەنووسرێت، تاكو لە ئەنجامدا بەرپرسیاری كردەوەكانی بێت.

بناغەی حەوتەم:

هەروەها تێدەگەیت كە: ئەو مردن و پووكانەوە و پرتووكانەی دووچاری بەدیهێنراوە ناسكۆڵە و جوانەكانی بەهار و هاوین دەبن، لەناوچوونی تەواوەتی و ئیعدامی هەتاهەتایی نین! بەڵكو لەكۆڵ كردنەوەی ئەركەكانیانە دوای ئەنجامدانیان و، حەوانەوەیانە لە كار و فرمانەكان[1] و، شوێن چۆڵ كردن و بواردانە بۆ بەدیهاتووە نوێكانی بەهاری ئاینده. كەواتە ئەو مردنەی ئەوان خۆ ئامادەكردن و شوێن حازر كردنە بۆ ئەو بوونەوەرە كار پێسپێرراوە نوێیانە.

هەروەها مردنی ئەوان، بێداركردنەوەیەكە بۆ ئەو خاوەن هەستانەی كە "بێئاگایی" ئەركی ئەستۆیانی لە بیر بردوونەتەوە و، "مەستی"ش ڕێی "شوكرانەبژێری"ی لێ گرتوون!

بناغەی هەشتەم:

هەروەها تێدەگەیت كە: بەدیهێنەرە هەمیشەییيەكەی ئەم جیهانە فانییە، جیهانێكی تری جگە لەمەی هەیە، كە جیهانی نەمری و هەتاهەتایيیە و، تاسە و شەوقی بەندەكانی بۆ ئەوێ دەورووژێنێت و، بەرەو ئەوێ دەیانداتە بەر.

بناغەی نۆهەم:

هەروەها تێدەگەیت كە: خواوەندی بەخشندەی میهرەبان، لەو جیهانە فراوانەدا، بە

---

(١) بەڵێ، گەڵا و بەر و گوڵی سەر لق و پەلی درەختەكان – كە گەنجینەی ڕۆزیدانی میهرەبانیی خواوەندن – لە دوای پیربوونیان و بەجێهێنانی ئەركی ئەستۆیان، دەبێ كۆچ بكەن، تاكو ڕێ لەوانەی دوای خۆیان نەگیرێت كە وەك لافاو دێن و شوێنی ئەمان دەگرن. دەنا دەبن بە بەربەستێكی سەخت لە بەردەم فراوانیی میهرەبانیی خوادا و پەردەیەكی ئەستوور لە ڕووی خوشك و برایانی خۆیاندا كە ئەوانیش بۆ ئەنجامدانی ئەركی خۆیان دێنە گۆڕێ. ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە هەر خۆیشیان بە نەمانی سەردەمی لاوییان، دەژاكێن و سیس دەبنەوە. بەم جۆرە، وەرزی بەهار وەك ئەو درەختە بەردارە حەشر پیشاندەرە وایە و.. مرۆڤی هەموو چەرخێكیش درەختێكی بەرداری پڕ لە دانایی و پەند و عیبرەتە و.. گۆی زەوییش – بە گشتی – درەختی توانستێكی ناوازەی داهێنكارە و.. دنیاش درەختێكی قەشەنگ و ڕەنگینی ئەوتۆیە كە بەروبوومەكانی خۆی بۆ بازاڕی قیامەت بەرێ دەكات. (دانەر)

چه‌نده‌ها نیعمه‌تی ئه‌وتۆ كه‌: نه‌ به‌ چاو بینراون و نه‌ به‌ گوێ بیستراون و نه‌ به‌ دڵی هیچ كه‌سێكیشدا هاتوون، ڕێز له‌ به‌نده‌ دڵسۆز و بێ گه‌رده‌كانی خۆی ده‌گرێت.. آمنّا.

## ڕاستیی حه‌وته‌م
### ده‌رگای: "پاراستن" و "پارێزگاری"
### كه‌ دره‌وشانه‌وه‌ی ناوی: "الحفیظ" و "الرقیب"ی خوای گه‌وره‌یه‌

ئایا ده‌گونجێ ئه‌و "پارێزه‌ر" و "چاودێر"ه‌ی كه‌ هه‌رچی شت له‌ ئاسمانه‌كان و زه‌وی و ده‌ریا و وشكایی‌دا هه‌یه‌، به‌ ڕێسا و هاوسه‌نگیی ته‌واو بپارێزێت و گه‌وره‌ و بچووكی هیچ كام له‌وانه‌ی لێ ون نه‌بێت.. "پارێزگاری" و "چاودێری"ی كردار و ڕه‌فتاره‌كانی ئه‌م مرۆڤه‌ نه‌كات كه‌ خاوه‌نی سروشتێكی به‌رزه‌ و، پله‌ی جێ‌نشینیی سه‌ر زه‌ویی دراوه‌تێ و، هه‌ڵگری ئه‌ركی ئه‌مانه‌تی هه‌ره‌ مه‌زنه‌؟.. ئایا ده‌گونجێ ئه‌و كرده‌وانه‌ی كه‌ ئه‌م مرۆڤه‌ ئه‌نجامیان ده‌دات و په‌یوه‌ندی‌یان به‌ په‌روه‌ردگارێتیی خواوه‌نده‌وه‌ هه‌یه‌ و یه‌خه‌ی په‌روه‌ردگارێتیی ئه‌و ده‌گرنه‌وه‌، ئه‌و پارێزه‌ره‌ نه‌یانپارێزێت و لێیان نه‌پرسێته‌وه‌ و به‌ ته‌رازووی عه‌داله‌ت هه‌ڵیان نه‌سه‌نگێنێت و، پاداشت و تۆڵه‌ی شایانیش بۆ بكه‌ره‌كانیان نه‌بڕێته‌وه‌؟ نه‌خێر.. خوای گه‌وره‌ گه‌لێ له‌وه‌ به‌رز و بڵند و مه‌زنتره‌.

به‌ڵێ، ئه‌و كه‌سه‌ی كاروباری ئه‌م گه‌ردوونه‌ به‌ڕێوه‌ ده‌بات، هه‌ر ئه‌وه‌ كه‌ هه‌موو شتێكی ناویشی به‌ ڕێسا و ته‌رازوو ده‌پارێزێت.. ڕێسا و ته‌رازووش دوو ڕووكاری: زانایی و، دانایی و، ویست و، توانستی ئه‌ون. چونكه‌ ئێمه‌ به‌ چاوی خۆمان ده‌بینین كه‌ هه‌رچی دروستكراوی پێشین و ئێستا و له‌مه‌ولایش هه‌ن هه‌رهه‌موویان به‌وپه‌ڕی ڕێكوپێكی و ته‌رازووكاری دروست كراون یان ده‌كرێن، ئه‌و ڕوخسار و شێوه‌ و وێنانه‌ش كه‌ هه‌موو بوونه‌وه‌رێك له‌ درێژایی ژیانی‌دا ده‌یانگۆڕێت له‌ ڕێكوپێكی‌یه‌كی گه‌لێ ورددان، هه‌روه‌ك هه‌موویشیان پێكه‌وه‌ له‌ نێوان ڕێسایه‌كی وردی مه‌حكه‌مدا ده‌رده‌كه‌ون..

هه‌روه‌ها ده‌بینین كه‌ ئه‌و شتانه‌ی كۆتایی به‌ ته‌مه‌نیان دێت و له‌گه‌ڵ ئه‌م كۆتایی هاتنه‌شدا ئه‌ركه‌كانی ئه‌ستۆیان ته‌واو ده‌بن و كۆچی ماڵئاوایی له‌م جیهانه‌ بینراوه‌ ده‌كه‌ن، هه‌موو ئه‌و شتانه‌، پارێزه‌ری شكۆمه‌ند وێنه‌كانیان هه‌ڵده‌گرێت و له‌ناو زه‌ینه‌كاندا – كه‌ چه‌شنی چه‌ند "لوح المحفوظ"ێكن[1] – و له‌و شتانه‌دا كه‌ وه‌ك ئاوێنه‌ی میسالی وان، ده‌یانپارێزێت. ئه‌وه‌تا زۆربه‌ی مێژووی ژیانی ئه‌و كۆچ كردووه‌ له‌ تۆوه‌كانی‌دا ده‌نووسێت و له‌سه‌ر به‌ره‌كانی‌دا ده‌یاننه‌خشێنێت و، به‌م كاره‌ش درێژه‌ به‌ ژیانی ده‌دات و له‌ چه‌ندین ئاوێنه‌ی ئاشكرا و

---

(١) سه‌یری په‌راوێزی وێنه‌ی حه‌وته‌م بكه‌. (دانه‌ر)

پەنهاندا بە پارێزراوی هەڵیاندەگرێت.. کەواتە هەموو یەکێ لە: یادخەرەوە(ذاکرة)ی مرۆڤ و.. بەری درەخت و.. ناوکی بەر و.. تۆوی گوڵ، مەزنیی هەمەلایەنگیریی پارێزگاری(الحفيظية) دەردەخەن و ڕوونی دەکەنەوە.

ئایا نابینیت لە وەرزی بەهاری فراوان و مەزندا چۆن پارێزگاریی هەموو شتێکی بەردار و گوڵدار دەکرێت و، چۆن لاپەڕەی تۆمارنامەی ئەو کارانەی تایبەتن بە هەرکام لەوان و گشت یاساکانی پێکهاتنیان و نموونەکانی وێنە و شێوەیان، لە چەند تۆوێکی کەمدا دەنووسرێن و هەڵدەگیرێن و دەپارێزرێن؟ پاشان هەر کە بەهاری نوێ دێتە گۆڕێ هەموو ئەو لاپەڕانە بەپێی حسابێکی ورد کە لەگەڵیاندا بگونجێ، هەڵدەدرێنەوە و لە شێوەی بەهارێکی نوێی مەزنی لەوپەڕی ڕێکوپێکی و دانایی‌دا دێنەوە ناو جیهانی "بوون"؟

ئایا ئەم کارە مەودای دەستەڵاتداری و، ڕادەی هێز و توانای هەمەلایەنگیریی "پاراستن"و "چاودێری" دەرناخات؟

جا کە لەو کاتەدا ئەم شتە بێ‌بایەخ و کاتی و ئاسایی‌یانە بەم ئەندازە ورد و هەمە لایەنەیە بپارێزرێن، ئایا ئیتر ئەو ئەنجامە مایەی نیگەرانیی هەموو کەسێکی ژیر نابێت کە پارێزگاریی کردارەکانی مرۆڤ نەکرێت و لە لایەن پەروەردگاریتیی ڕەهای خوای گەورەوە ڕەفتارەکانی نەپارێزرێن و لەسەری تۆمار نەکرێن؟.. ئەو مرۆڤەی کە خاوەنی چەندین بەروبوومی گرنگی سەر بە جیهانی پەنهانی غەیب و دوارۆژ و جیهانی ڕۆحە؟ ئایا دەگونجێ ئەمە پشت‌گوێ بخرێت و تۆمار نەکرێت؟ نەخێر..

بەڵێ، لە درەوشانەوەی ئاوا ڕوون و ئاشکرای "پارێزگاری"یەوە مرۆڤ تێدەگات کە: خاوەنی ئەم بوونەوەرانە بایەخێکی گەلێ گرنگ بە پاراستن و نووسینەوە و تۆمار کردنی هەموو ئەو شت و کاروبارانە دەدات کە لە موڵکی ئەودا ڕوودەدەن و، لە فەرمانڕەوایەتی و دەستەڵاتداریی پەروەردگاریتیی خۆیشی‌دا خاوەنی ئەوپەڕی چاودێری و بایەخ پێدانە، بە چەشنێك کە بچووکترین ڕووداو یان بێ‌بایەخترین کردار دەنووسێت و فەرمان بە تۆمار کردنی دەدات و، لە چەندین "دۆسیە"ی زۆر و زەبەندەدا وێنەی هەموو ئەو شتانە دەگرێت کە لە موڵکی ئەودا ڕوو دەدەن.

جا ئەم پاراستنە فراوان و وردانە، بەڵگەی گومان نەهێڵن لەسەر ئەوەی کە تۆمارێك بۆ لێپرسینەوەی کردارەکان دەکرێتەوە، بە تایبەت بۆ "مرۆڤ" کە بەدیهاتوویەکی ڕێز لێگیراوە و بە "سروشت"یش لەسەر چەندین تایبەتکاریی مەزن خولقێنراوە.. کردار و

ڕەفتارەكانی ئەم مرۆڤە - كە گەلێ مەزن و گرنگن - دەبێ ڕووبەڕووی تەرازوویەكی هەستیاری سەرنەكەر و لێپرسینەوەی ورد ببنەوە و، لاپەڕەی تۆماری كردەوەكانیشی هەڵبدرێنەوە و بخرێنە ڕوو.

ئەم مرۆڤەی كە بەهۆی: ئەمانەت هەڵگرتن و، شەرەفمەندبوونی بە پلەی جێنشینی، بوو بە خاوەنی ڕێز و پایەیەكی گەلێ بڵند و، ئنجا تا پلەی: پێشەوا و شایەتیدەر بەسەر بەدیهاتووانی تردا بەرز بووەوە، بەوەی كە بواری درا نوێنەری كاروباری بەندایەتی و تەسبیحاتی زۆربەی بەدیهێنراوان بێت و، لە گۆڕەپانی بەدیهاتووە زۆروزەبەندەكاندا - بە ناوی ئەوانەوە - یەكتایی خوای گەورە ڕابگەیەنێت و، كاروبارە هەمەكییەكانی پەروەردگاریتیش بە چاو ببینێت.. ئایا هیچ ژیرییەك بەوە قایل دەبێت كە "ئەم مرۆڤە" پشتگوێ بخرێت و بۆ خۆی بە ئارامی لەناو گۆڕەكەیدا بنوێت و لە خەو بێدار نەكرێتەوە و لەسەر گەورە و بچووكی كردەوەكانی پرسیاری لێ نەكرێت و، بەرەو گۆڕەپانی "حەشر" نەدرێتە بەر تا لە دادگای هەرە مەزنی ئەویدا دادگایی بكرێت؟.. نەخێر.. نەخێر.

پاشان چۆن دەگونجێ ئەم مرۆڤە بەرەو "نەمان" بڕوات و لەناو خاكدا خۆی بشارێتەوە و لە دەستی ئەو خاوەن توانستە شكۆمەندە خۆی قورتار بكات كە خاوەنی توانستێكی وەهایە هەموو ئەو ڕووداوانەی لە كاتەكانی پێشیندا ڕوویان داوە و موعجیزەی توانستی ئەون، تێكڕا دەبن بە شایەت لەسەر هاتنەدیی ئەو ڕووداوانەش كە لەمەولا و لە كاتەكانی داهاتوودا[1] بە توانستی ئەو، دێنەدی و ڕوو دەدەن.. ئەو توانستەی كە هەرچی ساڵە

(١) بەڵێ، ئەو "ڕابوردوو"ەی كە دەكەوێتە نێوان كاتی ئێستا و سەرەتای دروستبوونی جیهانەوە - وەك ئاشكرایە - پڕە لە چەندەها ڕووداوی جۆراوجۆر. هەموو ڕۆژێكی ئەو ڕابوردووەش كە هاتووەتە جیهانی "بوون"ەوە، وەك دێڕێك وایە و، هەموو ساڵێكیشی لاپەڕەیەكە و، گشت چەرخێكیشی كتێبێكە قەڵەمی قەدەر نووسیویەتی و نەخشەی كێشاوە و دەستی توانستیش بەوپەڕی دانایی و ڕێكوپێكی ئایەتە موعجیزە كارەكانی خۆی تێدا نووسیوەتەوە.. ئنجا "داهاتوو"یش كە هەر لە ئێستاوە تا قیامەت و بەهەشت و ئەبەدییەت درێژە دەكێشێت، یەكێكە لە شتە گونجاوەكان(الممكنات) واتە هەروەك "ڕابوردوو" بریتییە لە چەند ڕووداوێك كە بە ڕاستی و واقیعی ڕوویان داوە، "داهاتوو"یش مومكیناتن، دەگونجێ بە واقیعی ڕوو بدەن. جا ئەگەر زنجیرەی ئەم دوو كاتە بەرامبەر یەكتر ڕاگیر بكرێن، ئەوا دەردەكەوێت كە ئەو كەسەی "دوێنێ" و بەدیهاتووانی ناو دوێنێی بەدی هێنا، دەشتوانێت "سبەینێ" و بەدیهاتووانی ناو سبەینێش بەدی بهێنێت. هەروەها گومان لەوەشدا نییە كە بوونەوەران و شتانی دەراسا(خارق)ی سەردەمی "ڕابوردوو" - كە پیشانگای هەموو شتێكی سەیر و سەرسووڕهێنەرە - تێكڕا موعجیزاتی خواوەندی بەتوانای شكۆمەندن و شایەتێكی بەهێزی گومانبڕن لەسەر ئەوەی كە خوای گەورەی بە دەسەڵات دەتوانێت هەموو كاتەكانی "ئاینده" و تێكڕای مومكیناتی ناویشی بەدی بهێنێت و گشت موعجیزات و لایەنە سەرسووڕهێنەكانی بەدیهاتووانی خۆی تێدا پیشان بدات.

"زستان" و "بەهار"ی هاوچەشنی حەشر و قیامەت دروست دەکات؟

جا مادەم مرۆڤ لەم دنیایەدا بە ئەندازەی پێویست و بەو ڕادەیەی کە شایانیەتی ڕووبەڕووی بەرپرسیاری ناکرێتەوە، ئەوا - بێ هیچ گومانێك - ڕۆژێك دێت کە تیایدا بەرەو دادگایەکی هەرە گەورە و بەختەوەرییەکی یەکجار مەزن بڕوات و ڕووبەڕووی لێپرسینەوەی شیاوی خۆی ببێتەوە.

## ڕاستیی هەشتەم

### دەرگای "بەڵێن" و "هەڕەشە"

### کە درەوشانەوەی ناوی: "الجـــميل" و "الجليل"ی خوای گەورەیە

ئایا دەگونجێ داهێنەری ئەم بوونەوەرانە، کە یەکێکی خاوەن زانین و توانستی ڕەهایە، ئەو "بەڵێن" و "هەڕەشانە"ی خۆی نەباتە سەر کە پەیتا پەیتا و یەك لە دوای یەك و بە تەواتور گشت پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - ڕایان گەیاندووە و، سەرجەمی صیددیق و

---

بەڵێ، ئەو کەسەی بتوانێت تەنها یەك دانە "سێو" بەدی بهێنێت، دەشتوانێت هەموو سێوەکانی ناو ئەم جیهانە، تەنانەت سەرجەمی بەهاری مەزن بەدی بهێنێت، چونکە ئەو کەسەی نەتوانێت بەهار بەدی بهێنێت توانای بەسەر دروستکردنی یەك تاقە سێویشدا ناشکێت، چونکە ئەو یەك دانە سێوە لە کارگەی ئەو بەهارەدا دەچنرێت و تان و پۆ دەکرێت. کەواتە ئەو یەك دانە سێوە نموونەیەکی پوختی درەخت و باخی سێوەکەیە، بگرە نموونەی هەموو بوونەوەرانە بە گشتی. ئنجا هەر ئەو یەك دانە سێوە لە ڕووی سنعەت و وردەکاریی بەدیهاتنیشیەوە موعجیزەی سنعەتی پەروەردگارە، چونکە هەموو یەکێ لە تۆوەکانی، مێژووی ژیانی درەختەکەی ئەوی تێدا تۆمار کراوە. جا ئەو کەسەی کە بەم شێوە ناوازەیە بەدیی دەهێنێت، هەرگیزاو هەرگیز بەدیهێنانی هیچ شتێکی بەلاوە قورس و گران نییە.

هەروەك ئەمە وایە، هەر بەم جۆرەش: ئەو کەسەی "ئەمڕۆ"ی هێناوەتە بوون، دەتوانێت قیامەتیش بەدی بهێنێت.. ئەو کەسەی بەهاری بەدی هێناوە، دەتوانێت حەشریش بەدی هێنێت.. ئەو کەسەی جیهانەکانی پێشینی خستە ڕوو وە بەوپەڕی دانایی و ڕێکوپێکی بەسەر تەنافی زەماندا هەڵی واسین، بێ گومان هەر ئەو کەسە دەشتوانێت چەندین جیهانی تر بخاتە ڕوو وە بەسەر تەنافی "داهاتوو"دا هەڵیان بواسێت، هەروەك بە حەتمی و بێ هیچ گومانێکیش ئەو کارە لە واقیعدا ئەنجام دەدات..

ئێمە لە زۆربەی "وتەکان" بە تایبەت لە "وتەی بیست و دووهەم"دا بە چەشنێکی گومانبڕ چەسپاندمان کە: ئەو کەسەی نەتوانێت هەموو شتێك بەدی بهێنێت ناشتوانێت هیچ شتێك بەدی بهێنێت. خۆ هەر کەسێکیش بتوانێت تەنها یەك شت بەدی بهێنێت، دەتوانێت هەموو شتێکی تریش بەدیبهێنێت. بە هەمان جۆر گەر بەدیهێنانی شتان بەدەست یەك زاتی بەدیهێنەری تەنیاوە بێت، ئەوا بەدیهێنانی هەموو شتان بە ئەندازەی بەدیهێنانی یەك دانە شت ئاسان دەبێت. گەر بیشدرێتە پاڵ هۆکارە جۆراوجۆرەکان و بەدیهێنەرانی زۆروزەبەندە، ئەوا ئەو کاتە بە ئەندازەی پلەی نەگونجان(الإمتناع) و مەحاڵی، بەدیهێنان کارێکی سەخت و مەحاڵ دەبێت. (دانەر)

ئه‌ولیا و پیاوچاكانیش به‌ كۆی ده‌نگ شایه‌تی‌یان له‌سه‌ر داوه‌؟.. ئایا ده‌گونجێ ئه‌و هه‌واڵه‌ نه‌باته‌سه‌ر و، به‌مه‌ش كۆڵه‌واری و نه‌زانی ده‌رببڕێت؟.. نه‌خێر، خوای گه‌وره‌ گه‌لێ له‌وه‌ به‌رز و پایه‌بڵند و مه‌زنتره‌. خۆ ئه‌و "به‌ڵێن" و "هه‌ڕه‌شانه‌"ش كه‌ ڕایگه‌یاندوون هه‌رگیز بۆ توانستی ئه‌و كارێكی سه‌خت و دژوار نین و، گه‌لێ سووك و ئاسانن و چه‌شنی ئاسانیی دروست كردنه‌وه‌ی بوونه‌وه‌ره‌ له‌ ژماره‌به‌ده‌ره‌كانی به‌هاری پێشووان كه‌ چ خودی خۆیان[1] و چ به‌ هاووێنه‌یان[2] له‌ به‌هاری داهاتوودا سه‌رله‌نوێ دروستیان ده‌كاته‌وه‌.

ئنجا بردنه‌سه‌ری ئه‌و به‌ڵێنانه‌ هه‌روه‌ك بۆ ئێمه‌ و بۆ هه‌موو شتێكی تر كارێكی یه‌كجار پێویسته‌، به‌ هه‌مان جۆر خواستێكی به‌تین و داواكارییه‌كی پێویستی ده‌سته‌ڵاتی په‌روه‌ردگارێتیی خۆشیه‌تی، به‌ پێچه‌وانه‌ی: بێ‌به‌ڵێنی‌یه‌وه‌ كه‌ دژی عیززه‌تی توانستی ئه‌وه‌ و ئاوه‌ژووی "هه‌مه‌لایه‌نگیری" و "ڕه‌هایی"ی زانستیه‌تی، چونكه‌ "بێ‌به‌ڵێنی" ئه‌نجامی: بێ ده‌سته‌ڵاتی و نه‌زانی و كۆڵه‌واری‌یه‌!

ده‌سا ئه‌ی مرۆڤی ملنه‌ده‌ری سه‌رسه‌خت! ئایا ده‌زانیت به‌م كافری و ئینكاری كردنه‌ت ڕاده‌ی نه‌فامی و مه‌ودای مه‌زنیی تاوانه‌كه‌ت ده‌گاته‌ چ ئاستێك؟ ئه‌وه‌تا تۆ ده‌چیت باوه‌ڕ به‌ وه‌همه‌ درۆینه‌ و، عه‌قڵه‌ وڕێنه‌كار و ده‌روونه‌ هه‌ڵخه‌ڵه‌تێنه‌ره‌كه‌ی خۆت ده‌كه‌یت و به‌ ڕاستیان داده‌نێیت، كه‌چی – له‌ هه‌مان كاتدا – كه‌سێك به‌ درۆ ده‌خه‌یته‌وه‌ كه‌ هه‌رگیز ناچاری "به‌ڵێن شكێنی" نی‌یه‌ و ڕه‌فتاری پێچه‌وانه‌ی به‌ڵێنی خۆی ناكات، ته‌نانه‌ت ئه‌و كاره‌ هه‌ر شایانی عیززه‌ت و مه‌زنیی ئه‌ویش نی‌یه‌ و، هه‌موو شتێكی ناو بوونه‌وه‌ر و گشت ئه‌و شتانه‌ش كه‌ به‌ چاو ده‌بینرێن تێكڕا شایه‌تی له‌سه‌ر: ڕاستی و "ئه‌حه‌ققییه‌تی" ئه‌و ده‌ده‌ن؟! كه‌واته‌ تۆ له‌گه‌ڵ ئه‌م بچووكی‌یه‌ی خۆتدا تاوانێكی یه‌كجار گه‌وره‌ی بێ كۆتایی ده‌خه‌یته‌ ئه‌ستۆی خۆته‌وه‌ و، به‌م ڕه‌فتاره‌یشت – بێ گومان – خۆت شایانی تۆڵه‌یه‌كی گه‌لێ مه‌زن و سزایه‌كی هه‌میشه‌یی ده‌كه‌یت.

بۆ مه‌به‌ستی لێكدانه‌وه‌ و ده‌ركه‌وتنی گه‌وره‌یی تاوانی مرۆڤی كافر، له‌ فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ردا ﷺ هاتووه‌ كه‌: "خرێ"ی هه‌ندێ كه‌سانی ناو دۆزه‌خ به‌ ئه‌ندازه‌ی چیایه‌كی مه‌زن ده‌بێت[3].

---

(١) وه‌ك: ڕه‌گ و بنجی گیا و دره‌خته‌كان. (دانه‌ر)

(٢) وه‌ك: گه‌ڵا و به‌روبوومه‌كان. (دانه‌ر)

(٣) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: "إنّ ضرس الكافر، أو ناب الكافر مثل أُحُـد، وغلـظ جلده مسيرة ثلاث". رواه مسلم (٤/٢١٨٩) والترمذي – صفة جهنم. (وه‌رگێڕ)

تۆ، لەم هەڵوێستەتدا، وەك ئەو ڕێبوارە نەفامە وایت کە چاوی خۆی لە ئاستی ڕووناکیی خۆردا دەنووقێنێ و، شوێن ئەندێشەی خۆی دەکەوێت و، دەیەوێت لە بریی ئەو ڕووناکی‌یەی کە چاوی لە ئاستدا نووقاند، ئەو ڕێ ترسناکەی بەردەمی بەو تroووسکە کزەی عەقڵی خۆی ڕووناك بکاتەوە، کە چەشنی تروسکایی گوڵەستێرەکان وایە لە شەوی تاریکدا.

کەواتە، مادەم خوای گەورە بەڵێنی داوە و.. ئەم گشت بوونەوەرانەش وشەی ڕاست و حەقیانەتی ئەون و.. ئەم هەموو ڕووداوانەی جیهانیش چەند نیشانە و بەڵگەیەکی ڕاستگۆی ئەون.. ئەوا بە حەتمی بەڵێنەکەی دەباتەسەر و، دەرگای دادگایەکی یەکجار گەورە دەکاتەوە و، بەختەوەری‌یەکی تەواو مەزنیش بە بەندەکانی خۆی دەبەخشێت.

## ڕاستیی نۆهەم

دەرگای: "ژیاندن" و "مراندن"

کە درەوشانەوەی ناوی: "الحي القيّوم" و "المحيي" و "المميت"ی خوای گەورەیە

ئایا دەگونجێ ئەو کەسەی کە بە ژیاندنەوەی ئەم زەوی‌یە زەبەلاحە لە پاش مردنی و، بە زیندوو کردنەوەی پتر لە سێ سەد هەزار بەدیهێنراوانی جۆراوجۆر: "توانست"ی خۆی دەرخستووە، لە کاتێکدا کە زیندوو کردنەوەی هەموو یەکێ لەو جۆرانە بە ئەندازەی زیندوو کردنەوەی گرۆی مرۆڤ مایەی سەرسووڕمانە..

ئەو کەسەی کە یەك بە یەکی بوونەوەرانی لەناو ئەو تێکەڵی و پێکەڵی و ئاڵۆزکاوی‌یەدا لێك جیا کردووەتەوە و، بەمەش: "هەمەلایەنگیریی زانست"ی خۆی ئاشکرا کردووە..

ئەو کەسەی کە بەهۆی ئەو بەڵێنانەی سەبارەت بە هێنانەدیی حەشر لە فەرمانە ئاسمانی‌یەکانی‌دا ڕایگەیاندووە، سەرنجی بەندەکانی خۆی بۆ: "بەختەوەریی هەمیشەیی" ڕاکێشاوە..

ئەو کەسەی کە هەموو بوونەوەرانی وەك هاوڕێ و هاوشانی یەکتر لێ کردووە و، لە چوارچێوەی فەرمان و ویستی خۆی‌دا بەڕێوەی بردوون و یەك بە یەکی ئەوانی ژێربار خستووە و گوێڕایەڵ و ڕامی کردوون و لە یارمەتیدان و هاوکاریی یەکتری‌دا هەڵی سووڕاندوون و، بەم کارەش: "مەزنیی پەروەردگاریتی"ی خۆی دەرخستووە..

ئەو کەسەی بایەخێکی تەواو گرنگی بە گرۆی مرۆڤ داوە و، لەم پێناوەشدا هەموو بەروبوومەکانی درەختی بوونەوەرانی لە مرۆڤدا بە خەستی کۆ کردووەتەوە و، بەم پێ‌یە

مرۆڤی كردووە بە ناسك و نیانترین و نازدارترینی بەرەكانی ئەو درەختە ناوبراوە و، لە هەموو بوونەوەرانی تر دوعای پتر گیرا دەكات و، گشت شتێكی بۆ ژێربار دەخات و، دەیكات بە گفتوگۆ لەگەڵ كراوی خۆی..

ئایا دەگونجێ كەسێكی بەتوانا و، میهرەبان و، زانا و، دانای وا، كە گرنگییەكی ئاوەهای بەم مرۆڤە داوە، قیامەت نەهێنێتەكایەوە و حەشر بەدی نەهێنێت و مرۆڤ زیندوو نەكاتەوە؟ یان لە توانایدا نەبێت؟ یاخود بەرامبەر بە كردنەوەی دەرگاكانی دادگای هەرەمەزن و بەدیهێنانی بەهەشت و دۆزەخەوە دەستەوسان و كۆڵەوار بێت؟.. نەخێر.. هەرگیز وا نییە..

بەڵێ، ئەو پەروەردگارەی كە كاروباری ئەم جیهانەی بە دەستە، هەر لەم سەرزەوییە كاتی و تەسكەدا، هەموو چەرخێك و هەموو ساڵێك و تەنانەت گشت ڕۆژێك، چەندەها نموونە و وێنە و ئاماژەی حەشر دروست دەكات. بۆ نموونە: لە چەند ڕۆژێكی حەشری بەهاردا پتر لە سێسەد هەزار جۆری گەورە و درشتی ڕووەك و زیندەوەران حەشر دەكات و زیندوویان دەكاتەوە و.. ژیان بە: ڕەگ و بنجی درەخت و گژوگیاكان دەبەخشێتەوە و.. خودی هەندێ زیندەوەر و هاووێنەی هەندێكی تریان دەژیێنێتەوە و دەیانهێنێتەوە بۆ بەهاری نوێ. ئنجا هەرچەندەش جیاوازییە ماددییەكانی نێوان تۆوە هەرە وردیلە و بچووكەكان تابلێی هەندەكی و لاوەكی و كەمن، كەچی بەوپەڕی وردی و لێك جیا كردنەوە، یەك بە یەكیان زیندوو دەكرێنەوە و، بەوپەڕی خێرایی و لە ماوەی شەش ڕۆژ یان شەش حەفتەدا لە یەكتر جودا دەبنەوە و بەرجەستە دەبن. هەموو ئەم كارانەش لەوپەڕی ئاسانی و زۆریدا و، بە ڕێكوپێكیی تەواو و، تەرازووی وردی سەرنەكەر ئەنجام دەدرێن، هەرچەندەش ئەو تۆوانە تێكەڵی یەكتری بوون.

ئایا ئەو كەسەی كە ئەم كارانە ئەنجام دەدات، هیچ شتێكی بەلاوە گران دەبێت؟ یان ئایا لە دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی لە ماوەی شەش ڕۆژدا دەستەوسان دەمێنێت؟.. ئایا ناتوانێ بە تەنها یەك "بانگ" سەرجەمی گرۆی مرۆڤ حەشر بكات و كۆیان بكاتەوە؟ حاشا.. چۆن ناتوانێت!

ئایا ئەگەر نووسەرێكی دەراسا(خارق)ی بێ وێنە ببێت و، لە ماوەی تەنها یەك سەعاتدا – بێ تێكەڵ كردن و لێ تێكچوون و ناتەواوی – لەسەر یەك لاپەڕەدا و بەوپەڕی جوانی، سێ سەد هەزار كتێب بنووسێتەوە كە هەموو پیتەكانی سڕرابنەوە و كوژێنرابنەوە و، ئنجا پێت بوترێت: "ئەم نووسەرەی كە خاوەنی توانا و لێهاتنێكی ئاوەهایە، دەتوانێت لە ماوەی یەك خولەكدا و بە: "لەبەر بوون" سەرجەمی كتێبەكەی تۆ بنووسێتەوە كە دانراوی خۆیەتی و

ئێستا کەوتووەتە ناو ئاوەوە و پیتەکانی کوژاونەتەوە".. ئایا دەتوانیت بڵێیت: "ناتوانێت.. باوەڕ ناکەم"؟!

یان گەر پادشایەکی موعجیزەکاری ئەوتۆ هەبێت کە لە پێناوی دەرخستنی توانای خۆیدا بۆ خەڵکی و بەڵگەهێنانەوە لەسەر ئەو توانایەی لە پێش‌چاوی ئەواندا، بە تەنها یەك ئاماژەی خۆی، چیا لەبن بهێنێت و، چەندەها شار بە تەواوەتی بگۆڕێت و، دەریاکان بکات بە وشکایی.. هەر لە دەماودەمی ئەو کاتانەی کە ئەم کارانەی لێ دەبینرا، تاشە بەردێکی زەبەلاح بەرەو شیوێك تلێر بووەوە و ڕێی لە میوانەکانی ئەو پادشایە گرت و، ئنجا پێت وترا: "بێ هیچ گومانێك، پادشا ئەو بەردە زەبەلاحە لەسەر ئەو ڕێیە لادەبات و، هەرچەندەش گەورە بێت پادشا باکی نییە وردوخاشی دەکات و نایەڵێت ڕێ لە میوانەکانی بگیرێت". ئایا وەڵامەکەت چەندە بە وڕێنە و شێتی دادەنرێت گەر بڵێیت: "نەخێر، ناتوانێت کاری وا بکات"؟!

یان ئەگەر سەرکردەیەك بێت و بتوانێت لە ماوەی یەك ڕۆژدا سەر لەنوێ یەك بە یەکی سوپاکەی کۆ بکاتەوە کە هەر خۆی یەکەم جار پێکی هێنابوون و، پێت وترا: "ئەم سەرکردەیە تەنها بە فووپیاکردنێکی شەیپووری سەربازی دەتوانێت یەك بە یەکی سەربازەکانی ئەو هێزانە و سەرجەمی ئەوانەی بڵاو بوونەتەوە و تەسریح کراون، لە ژێر ئاڵاکەی خۆیدا کۆ بکاتەوە" و، تۆیش لە وەڵامدا وتت: "نا.. باوەڕناکەم"؟ ئایا هێشتا تێناگەیت کە وەڵامەکەت ڕەفتارێکی چەندە شێتانە دەردەخات؟!

ئەگەر لەم سێ نموونەیەی پێشوو تێ گەیشتوویت، ئەوا فەرموو بیر لە: "بەدیهێنەری نەخشەکێشی مەزن" بکەرەوە کە هەر لە پێش‌چاوی خۆماندا، بە شێوە و وێنەیەکی تابلێی جوان و تەواو، زیاتر لە سێ سەد هەزار جۆری زیندەوەر بە قەڵەمی: "توانست" و "قەدەر"ی خۆی لەسەر لاپەڕەی زەویدا دەنووسێت و، لاپەڕە سپییەکەی زستان دەگۆڕێت بە گەڵا دەم پشکوتووەکانی بەهار و هاوین و، هەموو ئەمانە لەگەڵ یەکتریدا تێهەڵکێش دەکات بێ ئەوەی ئاوێتەی یەکتر ببن و، پێکەوە دەیاننووسێت بێ ئەوەی پاڵنان و ئاڵۆزی و لێ تێکچوون و شپرزی لە هیچیاندا ڕوو بدات و، ئنجا هەرچەندەش لە شکڵ و شێوە و پێکهاتندا لە یەکتر جیاوازن، کەچی هیچ کام لەوانە بە هەڵە نانووسێت.. جا ئایا دەگونجێ سەبارەت بەم "پارێزگار" و "دانا"یەی کە پلان و بەرنامەی "گیان"ی درەختێکی زەبەلاحی لە تۆوە هەرە بچکۆلەکەیدا داناوە و لەوێدا دەیپارێزێت، بوترێت: چۆن دەتوانێت پارێزگاریی "گیان"ی مردووان بکات؟..

یان ئایا ده‌گونجێ سه‌باره‌ت به‌و خواوه‌نده به‌توانا و شكۆمه‌نده‌ی كه به خێرایی‌یه‌كی یه‌كجار زۆر گۆی زه‌وی له سووڕی ساڵانه‌ی‌دا ده‌خاته‌گه‌ڕ، بوترێت: چۆن ده‌توانێت زه‌وی له‌سه‌ر ڕێی قیامه‌ت لابدات؟ یان چۆن ده‌یڕووخێنێت؟!

یان ئایا سه‌باره‌ت به‌و خواوه‌نده شكۆمه‌ند و خاوه‌ن كه‌ره‌مه‌ی كه له نه‌بوونه‌وه به فه‌رمانی: "كن.. فیكون" گه‌ردیله‌كانی له‌ناو جه‌سته‌ی سه‌ربازانی زینده‌وه‌راندا به‌دی هێناوه و ڕێكی‌خستوون و، چه‌نده‌ها سوپای گه‌وره‌ی لێ پێكهێناون، بوترێ: چۆن ده‌توانێت ته‌نها به یه‌ك هاوار لێكردن ئه‌و گه‌ردیله بناغه‌یی‌یانه‌ی كه زووتر ئاشنایی‌یان له‌گه‌ڵ یه‌كتری‌دا بووه و، ئه‌و به‌شه سه‌ره‌كی‌یانه‌ش كه پێشتر له ژێر ئاڵا و ڕێسای له‌شكری جه‌سته‌ی ئه‌و زینده‌وه‌ره‌دا بوون، سه‌ر له‌نوێ كۆ بكاته‌وه؟!

ئه‌وه‌تا هه‌ر به چاوی خۆت چه‌نده‌ها نموونه‌ی چه‌شنی نموونه‌كانی حه‌شری به‌هار ده‌بینیت كه له هه‌موو وه‌رزێك و گشت چه‌رخێكدا به‌دیهێنه‌ری مه‌زن به‌دی‌یان ده‌هێنێت. ته‌نانه‌ت له ئاڵوگۆڕبوونی شه‌و و ڕۆژ و، پێكهێنان و نه‌هێشتنی په‌ڵه هه‌وره‌كانی ڕووی ئاسماندا، چه‌ندین نیشانه و نموونه‌ی حه‌شر به چاوی خۆت ده‌بینیت.

گه‌ر - بۆ نموونه - خۆت وا دابنێیت كه له هه‌زار ساڵ پێش ئێستادایت و، هه‌ردوو باڵی "ڕابوردوو" و "داهاتوو" به‌رامبه‌ر یه‌ك ڕابگریت، ئه‌وا به ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی چه‌رخ و ڕۆژه‌كانی هه‌ردوو زه‌مانه‌كه نموونه‌ی حه‌شر و قیامه‌ت ده‌بینیت!

خۆ ئه‌گه‌ر دوای ئه‌وه‌ی كه ئه‌م هه‌موو نموونه زۆر و زه‌به‌ندانه‌ی حه‌شرت به چاو بینی و، هێشتا حه‌شری جیسمانی و زیندوو كردنه‌وه‌ی جه‌سته‌كانت له عه‌قڵه‌وه به دوور زانی، ئه‌وا هه‌ر خۆیشت ڕاده‌ی نه‌فامیی ئه‌و كه‌سه‌ت بۆ ده‌رده‌كه‌وێت كه ئینكاریی حه‌شر ده‌كات!!

سه‌رنج بده و بزانه ده‌ستووری هه‌ره مه‌زنی خوای گه‌وره سه‌باره‌ت به‌م ڕاستی‌یه چی ده‌فه‌رموێت:

**﴿فانظرْ إلى آثارِ رحـمتِ الله كيفَ يُحي الأرضَ بعدَ مَوتِها إنَّ ذلك لمُحي الموتى وهو على كلِّ شيءٍ قدير﴾** (الروم: ٥٠).

**پوخته‌ی ئه‌م قسانه:**

هیچ شتێك نی‌یه ڕێ له هاتنه‌دیی حه‌شر بگرێت، به‌ڵكو هه‌موو شتێك داواكار و داخوازی هاتنه‌دیی حه‌شره.

به‌ڵێ، ئه‌و كه‌سه‌ی كه وا ئه‌م "زه‌وی"یه زه‌به‌لاحه - كه پیشانگای شته سه‌رسووڕهێنه‌ره‌كانه - به چه‌شنی زیندوو كردنه‌وه‌ی هه‌ر گیانداری‌ك زیندوو ده‌كاته‌وه و ده‌یشی مرێنێت و، وه‌ك لانكێكی حه‌وێنه‌ر و كه‌شتی‌یه‌كی جوانی ڕازاوه‌ی لێ كردووه بۆ

مرۆڤ و زیندەوەرانی تر و.. "خۆر"یشی لەم میوانخانەیەدا کردووە بە چرا و ئاگردانی میوانەکانی و.. "هەسارە" گەڕۆکەکان و "ئەستێرە" پرشنگدارەکانیش بە فرۆکەی مەلائیکەتەکانی.. "پەروەردگاریتیی" مەزنی تا ئەم ڕادەیە و، "فەرمانڕەوایی" هەمەلایەنگیری گەورەی تا ئەم پلەیە، تەنها بەم شتە دنیاییيە فانی و لاواز و بەخوڕەم و بێنرخ و بگۆڕانەوە گیر نابن و، دەبێ خانەیەکی تری هەتاهەتایی و، مەزن و، گەورە و، نەگۆڕ هەبێت کە شایانی ئەو "پەروەردگاریتی"یە مەزن و "فەرمانڕەوایەتی"یە هەمەلایەنگیرەی ئەو بێت و، بۆ مەبەستی شاد بوون و بەهرەوەر بوونمان بەو خانە و لانانەی ئەوێ، وا هەمیشە بۆ هەوڵدان و تەقالای بەردەوام هانمان دەدات و دەعوەتمان دەکات و بۆ ئەوێمان دەبات.

ئنجا هەموو ئەو کەسانەی کە خاوەنی ڕۆحی ڕوون و، جەمسەری دڵانی ڕووناکن و، دارای ژیریی ڕۆشنایی بەخشن و، ڕووی ڕواڵەتیی ڕاستی‌یان دیوادەر کردووە و بەرەو ناوجەرگەی حەقیقەت ڕۆشتوون و، شەرەفمەندی: "لەخوا نزیکی" بوون.. هەموو ئەوانە، شایەتی لەسەر ئەو ڕاستی‌یەی سەرەوە دەدەن و، بە یەك دەنگ پێمان ڕادەگەیەنن کە: خوای گەورە پاداشت و سزای ئامادە کردووە و، بەڵێنی بێگومان و هەڕەشەی ڕاستەقینەی تەواوەتیشی ڕاگەیاندووە. خۆ "بەڵێن شکاندن" هەرگیز توخنی شکۆمەندیی خاوێنی ئەو ناکەوێت، چونکە کاری وا، سووکایەتی و خۆ زەلیل کردن دەگەیەنێت. ئنجا "نەبردنە سەری هەڕەشە"یش یان لە چاوپۆشی‌یەوە دەبێت یان لە کۆڵەواری‌یەوە. سەبارەت بە یەکەمیان ئەوا وەك ئاشکرایە "کافرێتی" تاوانێکی ئەوەندە ڕەهایە[1] کە شایانی چاوپۆشی و لێخۆشبوون نی‌یە. سەبارەت بە دووهەمیشیان ئەوا ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو خواوەندەی خاوەنی "توانستی ڕەها"یە، گەلێ خاوێن و دوورە لە کۆڵەواری و بێ دەستەڵاتی.

پاشان هەواڵدەران و شایەتی‌دەرانیش، هەرچەند ڕێباز و مەشرەبیان لە یەکتری جیایە، کەچی بە تەواوەتی لەسەر بناغەکانی ئەم مەسەلەیە یەکیان گرتووە. ئەو هەواڵدەر و شایەتی‌دەرانە:

---

(١) بەڵێ، "کافرێتی" سووکایەتی پێکردن و بێ نرخ زانینی بوونەوەرانە بە گشتی، چونکە "کوفر" بوونەوەران بە: "بێ مەبەستی" و "بێ سوودی" تۆمەتبار دەکات و، لە هەمان کاتیشدا ناوە جوانەکانی خوای گەورە بەدرۆ دەخاتەوە، لەبەر ئەوەی کە "کوفر" ئینکاریی درەوشانەوەی ئەو ناوانە دەکات کە لەناو ئاوێنەی بوونەوەراندان و، بەدرۆ خستنەوەی هەموو بوونەوەرانیشە، ئەوەتا شایەتی‌دانی ئەوان لەسەر "وەحدانییەت" وەرناگرێت. لەبەر ئەمانە، "کافرێتی" هەموو هێزە مەعنەوی‌یەکانی مرۆڤ و گشت لێهاتنەکانی تێکدەدات، بە ڕادەیەك کە توانای وەرگرتنی خێر و چاکەی لێ دادەماڵێت. کەواتە "کوفر" تاوانێکی گەلێ گەورەیە و، دەستدرێژی کردنە بۆ سەر مافی هەموو بوونەوەران و سەرجەمی ناوە جوانەکانی خوای گەورە. لەبەر ئەوە و، لەبەر پاراستنی ئەو مافانە و، بە بۆنەی وەرنەگرتنی خێر لە لایەن دەروونی مرۆڤی کافرەوە، "کافرێتی" داخوازی بێبەش بوونە لە "چاوپۆشی و لێخۆشبوون" وەك ئایەتی: ﴿إنّ الشركَ لظلمٌ عظيم﴾ (لقمان:١٣) ئەم واتایە ڕادەگەیەنێت. (دانەر)

لە ڕووی چەندایەتی‌یەوە: ئەوەندە زۆر و زەبەندەن كە گەیشتوونەتە پلەی "تەواتور" و..
لە ڕووی چۆنایەتی‌یەوە: دارای پلەی كۆدەنگی(الإجــماع)ن و..
لـە ڕووی پلـە و پایەشیـانەوە: ئەستێرە و ڕێ پیشـاندەر و ڕابـەر و ئـازیز و بینـایی چـاوی گرۆی مرۆڤایەتین و..
لە ڕووی گرنگیشەوە: ئەوان لەم مەسەلانەدا "پسـپۆڕی بابـەت" و "بـەرەی چەسپێنەر"ن. خۆ وەك ئاشكرایە بڕیاری دوو كەسی "پسپۆڕ"ی زانستێك یـان سنعەت و پیشـەیەك، بەسـەر بڕیـاری هـەزارانی غـەیری ئـەواندا پێش دەخرێـت و.. لـە هـەواڵ و گێڕانـەوەی ڕیوایەتیشـدا قسەی دوو كەسی "چەسپێنەر" بەسـەر قسـەی هـەزاران كەسـی نەفی‌كـەردا سـەر دەخرێـت، وەك: چەسپاندنی بینینـی مـانگی یـەك شـەوەی ڕەمەزان كـە گـوێ لـە دوو كەسـی چەسپێنەر دەگیرێـت و قسەی هەزاران نەفی‌كەر پشت‌گوێ دەخرێت.
**كەواتە**: لە هەموو جیهاندا، هەواڵی لەمە ڕاستتر و، كێشەی لەمە حەقتر و، ڕاستی‌یەكی لەمە ڕوون و ئاشكراتر نی‌یە!
دنیا كێڵگەیە و..
حەشر خەرمانە و..
بەهەشت و دۆزەخیش گەنجینەی داهاتەكانی ئەو كێڵگە و خەرمانەن.

## ڕاستیی دەهەم

دەرگای: "دانایی" و "چاودێری" و "میهرەبانی" و "دادگەری"
كە درەوشانەوەی ناوی: "الحكیم" و "الكریم" و "العادل" و "الرحیم"ی خوای گەورەیە

ئایا دەگونجێ ئەو "خاوەن موڵكە شكۆمەندە"ی كە لـەم میوانخانە فانی‌یـەی دنیـادا و، لـەم كۆڕی تاقیكردنەوە هەمیشە بەرەو نەمان چـووە و، لـەم پیشـانگا هـەردەم گۆڕاوەی زەوی‌دا، بـەم ئەندازەیـەی بـەرچاومان شوێنەواری "دانـایی" ڕوون و.. تا ئـەم مەودایـەش شـوێنكاری "چاودێری"ی ئاشكرا و.. تا ئەم پلەیـە ئاسەواری "دادگـەری"ی زاڵ و.. بـەم ڕادەیـەش جـێ دەستەكانی "میـهرەبانی"ی فراوانـی خـۆی دەرخسـتبێت.. پاشـان لـە جیـهانی "مولـك"و "مەلەكووت"ی خۆی‌دا چەندین خانـە و لانـەی بـەردەوام و دانیشـتووانی نـەمر و پلەوپایـەی هەمیشـەیی و بوونـەوەرانی هەتاهـەتایی نـەبێت و، بـەم پێیـە سـەرجەمی ئـەو حەقیقەتـە ئاشكرایانەی ئـەم: "دانـایی" و "چـاودێری" و "دادگـەری" و "میـهرەبانی"یـە بـە خۆڕایـی و هەڕەمەكی بڕۆن و بدرێن بە بادا؟

یان ئایا دەچێتە عەقڵەوە ئەو "دانا شکۆمەندە"ی کە لە نێوان هەموو بەدیهێنراوانیدا مرۆڤی هەڵبژاردووە و، کردوویەتی بە گفتوگۆلەگەڵکراو(مخـــاطب)ی هەمەکیی خۆی و ئاوێنەی دەرخەر و پیشاندەری ناوە جوانەکانی و، نرخ شناس و قەدرزان و تام چێژی ئەو سەرچاوانەی کە لە گەنجینەکانی میهرەبانیی ئەودان.. ئەو کەسەی کە لە ڕێی هەموو ناوە جوانەکانیەوە زاتی مەزنی خۆی بە مرۆڤ ناساندووە و خۆشی ویستووە و خۆیشی لای ئەو خۆشەویست کردووە.. ئایا دوای هەموو ئەمانە، دەچێتە عەقڵی هیچ مرۆڤێکی ژیرەوە کە ئەو خواوەندە "دانا"یە ئەم مرۆڤە هەژارە بۆ ئەو وڵاتە هەمیشەییەی خۆی نەنێرێت و، دوای دەعوەت کردنی بۆ خانەی ئەوێی، بەختەوەریی هەتاهەتایی پێ نەبەخشێت؟

یان ئایا دەچێتە عەقڵەوە کە هەموو بوونەوەرێك - با "تۆو"ێکیش بێت - بە ئەندازەی درەختێك "کار و فرمان"ی بخرێتە ئەستۆ و، بە قەدەر ژمارەی گوڵەکانیشی "دانست"ی تێدا ڕەچاو بکرێت و، بە ئەندازەی بەروبوومەکانیشی سوود و "بەرژەوەندی"ی پێدا هەڵبواسرێت، پاشان ئامانج و مەبەستی "بوون"ی ئەو گشت: "کار و فرمان و، حیکمەت و، بەرژەوەندییانە" تەنها ئەو بەشە کەمە جوزئییە ڕووەو دنیا ئاراستە کراوە بێت کە هێشتا بە ئەندازەی کێشی گەردیلەیەکیش دارای بایەخ و گرنگی نییە؟ واتە ئامانجی "بوون"ی تەنها ئەم دنیایە بێت و، ئەو کار و فرمان و، حیکمەت و، بەرژەوەندییانە نەکرێن بە چەند تۆوێك بۆ جیهانی مەعنا و کێڵگەی جیهانی دوارۆژ تاکو ئامانجە ڕاستەقینەکانیان لەوێ بەرهەم بهێنن؟

یان ئایا دەچێتە عەقڵەوە کە ئەم هەموو فیستڤاڵە ڕەنگین و ئاهەنگە مەزنانەی لێرەدا ساز دەکرێن، لە ئەنجامدا بە هەڕەمەکی و بێئامانج و بێ ناوەرۆك و بێ دانایی بڕۆن و لەناو بچن؟! ئایا دەچێتە عەقڵەوە کە هەموو ئەوانە بۆ مەبەستی دەرکەوتنی ئامانجە ئەسڵییەکانیان و بەروبوومە شایستەکانیان بەرەو جیهانی مەعنا و دوارۆژ ئاراستە نەکرێن؟!

بەڵێ.. ئایا دەگونجێ هەموو ئەوانە بە پێچەوانەی حەقیقەت و دژی وەسفە پیرۆز و ناوە جوانەکانی: "الحکیم" و "الکریم" و "العادل" و "الرحیم"ی خوای گەورە دەربکەون؟.. نەخێر.. نەخێر..

یان ئایا دەگونجێ خواوەندی مەزن هەموو ئەو حەقیقەتانەی گشت بوونەوەران بە درۆ بخاتەوە کە بەڵگەی وەسفە خاوێنەکانی: "دانایی و، دادگەری و، بەخشندەیی و، میهرەبانی"ی ئەون و، شایەتیی گشت بوونەوەران وەرنەگرێت و، بەڵگەکانی هەموو بەدیهێنراوان و دروستکراوان بەتاڵ بکاتەوە؟!.. نەخێر.. نەخێر..

یان ئایا ده‌چێته عه‌قڵه‌وه ئه‌و خواوه‌نده مه‌زنه، ته‌نها پاداشتێكی كه‌می دنیایی به ئه‌ندازه‌ی تاڵه موویه‌ك به مرۆڤ ببه‌خشێت، له كاتێكدا كه به ئه‌ندازه‌ی هه‌موو تاڵه مووه‌كانی سه‌ری كار و ئه‌ركی پێ سپاردووه؟ ئایا ده‌گونجێ ئه‌و خواوه‌نده كارێكی ئاوا پووچی بێ ناوه‌رۆك و دژی عه‌داڵه‌ت و حیكمه‌تی ڕاسته‌قینه‌ی خۆی بكات؟.. نه‌خێر.. نه‌خێر..

یان ئایا ده‌گونجێ ئه‌و خواوه‌نده گه‌وره‌یه به ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی به‌ری هه‌موو دره‌ختێك "دانایی" و "به‌رژه‌وه‌ندی" به هه‌موو زینده‌وه‌رێك، به‌ڵكو به هه‌موو ئه‌ندامێكی ئه‌و زینده‌وه‌ره - بۆ نموونه: وه‌ك زمانی- ته‌نانه‌ت به گشت به‌دیهاتوویه‌كی خۆی، ببه‌خشێت و به‌مه‌ش "دانایی ڕه‌ها"ی خۆی ده‌ربخات.. پاشان هه‌ر ئه‌و خواوه‌نده دانایه، مانه‌وه و، هه‌تاهه‌تایه‌تی و، به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشه‌یی، به مرۆڤ نه‌به‌خشێت كه مه‌زنترین "دانایی" و گرنگترین "به‌رژه‌وه‌ندی" و پێویسترین "ئه‌نجامه" و.. واز له به‌خشینی: "مانه‌وه" و "به‌یه‌ك شادبوون"و "به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشه‌یی" بهێنێت كه هه‌ر ئه‌وانه‌ن - له ڕاستیدا - دانایی‌یان كردووه به دانایی و نیعمه‌ت به نیعمه‌ت و میهره‌بانیش به میهره‌بانی؟ ته‌نانه‌ت هه‌ر ته‌نها ئه‌وانه‌ن كه سه‌رچاوه‌ی هه‌موو دانایی و نیعمه‌ت و میهره‌بانی‌یه‌كن؟ ئایا ده‌گونجێ ده‌ستیان لێ هه‌ڵبگرێت و وازیان لێ بهێنێت تا به‌ره‌و دۆڵی بێ‌مه‌به‌ستی و به‌ربادیی ڕه‌ها برۆن و، خۆیشی - خوا نه‌خواسته - بخاته هه‌ڵوێستی ئه‌و كه‌سه‌وه كه باڵه‌خانه‌یه‌كی مه‌زن بنیات بنێت و، هه‌زاران نه‌خش و نیگاری ڕه‌نگین له هه‌موو به‌ردێكی‌دا بنه‌خشێنێت و، له یه‌ك به یه‌كی گۆشه‌كانی كۆشكه‌كه‌یشی‌دا هه‌زاران ئامرازی ئارایشتدان و جوانكاری و، له گشت ژوورێكی‌دا هه‌زاران شتی گرانبه‌ها و پێداویستی دابنێت.. پاشان سه‌ربان و میچێكی بۆ دروست نه‌كات كه له هه‌موو مه‌ترسی‌یه‌كی چه‌شنی: ڕووخان و تێكچوون بیپارێزێت؟!.. نه‌خێر.. نه‌خێر.. چونكه "خێر" ته‌نها له "خێری ڕه‌ها" و "جوانی"ش ته‌نها له "خاوه‌ن جوانیی ڕه‌ها"وه په‌یدا ده‌بن و، هه‌رگیزاو هه‌رگیز كاری گاڵته‌جاڕی و بێ‌مه‌به‌ستی له خواوه‌ندی خاوه‌نی "دانایی ڕه‌ها" ناوه‌شێته‌وه.

به‌ڵێ، هه‌ر كه‌سێ به مێژوودا بچێته‌وه و به ئه‌ندێشه‌ی خۆی بۆ سه‌رده‌مه‌كانی ڕابوردوو بڕوات، ئه‌وا به ژماره‌ی هه‌موو ئه‌و ساڵانه‌ی به سه‌ریاندا تێ‌ده‌په‌ڕێت، مه‌نزڵ و، پیشانگا و، گۆڕه‌پان و، جیهان ده‌بینێت، كه وه‌ك ئه‌م دنیایه و چه‌شنی مه‌یدانی تاقیكردنه‌وه و پیشانگای شتانی ئه‌م سه‌رده‌مه وان.. ده‌بینێت كه مردن هه‌ر هه‌موویانی به‌سه‌ر كردووه‌ته‌وه. هه‌روه‌ها سه‌رنج ده‌دات كه هه‌رچه‌نده‌ش جۆر و شێوه‌ی یه‌ك به یه‌كی ئه‌وانه له یه‌كتر جیاوازه، كه‌چی له: ڕێكوپێكی و، داهێنان و، ده‌رخستنی توانا و دانایی به‌دیهێنه‌ریاندا، تێكڕا له یه‌ك ده‌چن..

هه‌روه‌ها ئه‌و كه‌سه - گه‌ر بینایی دڵی له‌ده‌ست نه‌دابێت - ئه‌وه‌نده ڕێسای ڕوونی

"دانایی" و، ئاماژەی ئاشکرای "چاودێری" و، نیشانەی زەق و زاڵی "دادگەری" و، بەرهەمی فراوانی "میهرەبانی" لەو مەنزڵە ئاڵوگۆڕبوانەدا دەبینێت کە وای لێ دەکەن بە دڵنیاییەوە پەی ببات بەوەی کە: هەرگیز ناگونجێ داناییەك هەبێت لەو "دانایی"یەی کە لەو مەنزڵگایانەدا دەبینرێت کاملتر بێت و.. "چاودێری"یەك بێت لەچاو ئەوەی کە ئاسەواری ئاشکرایە جوانتر بێت و.. "دادگەری"یەکی مەزنتر هەبێت لەوەی کە نیشانەکانی ڕوون و لە بەرچاودان و.. "میهرەبانی"یەکیش ببێت فراوانتر بێت لەمەی کە بەروبوومەکانی بە ئاشکرا دەبینرێن!

خۆ ئەگەر گریمانی مەحاڵ بکرێت و وا دابنرێت ئەو پادشا هەمیشەییەی کە ئەم کاروبارانە بەڕێوە دەبات و بەردەوام ئەو میوان و میوانخانانە دەگۆڕێت، جێ و ڕێ و مەنزڵگای بەرزی مانەوە و هەمیشەیی و.. پلە و پایەی نەگۆڕ و.. خانە و لانەی بەردەوام و.. ڕەعیەتی هەتاهەتایی و.. بەندەی بەختەوەری نیشتەجێی ئەو وڵاتە هەمیشەییەی خۆی نەبێت، ئەوا دەبێ - لەو کاتەدا - ئینکاریی بوونی ئاشکرا و لەبەرچاوی ئەو چوار ڕاستییەی: "دانایی و، دادگەری و، چاودێری و، میهرەبانی" بکرێت کە چەند توخمێکی بەهێزی هەمەلایەن گرن و، وەك توخمەکانی: ڕووناکی و هەوا و خاك و ئاو، ڕوون و ئاشکران. چونکە - وەك زانراوە - ئەم دنیایە و هەرچییەکی تێدایە هێشتا بەشی ئەوە ناکات کە بە تەواوی ئەو ڕاستییانەی تێدا دەربکەون.

کەواتە، گەر لە شوێنێکی تردا شتانێك نەبن شایستەی دەرکەوتنی ئەو ڕاستییانە بن، ئەوا دەبێ بە هەڵوێستێکی شێتانەی چەشنی ئەو کەسەی ئینکاریی "خۆر"ی ناوجەرگەی ئاسمان دەکات، ئێمەش ئینکاریی ئەو "دانایی"یە بکەین کە لە هەموو شتێکی بەردەمماندا هەیە و.. سەرپێچی لەو "چاودێری"یە دەربڕین کە لە خۆمان و زۆربەی شتانی دەوروبەرماندا دەیانبینین و.. دان بەو "دادگەری"یە مەزنەدا نەنێین کە نیشانەکانی گەلێ ئاشکران[1] و..

(١) بەڵێ، "دادگەری" دوو کەرتە: ئیجابی و سەلبی. کەرتە ئیجابییەکەیان بریتییە لەوەی: گشت خاوەن مافێك هەموو مافێکی خۆی بدرێتێ. شتێکی بەڵگەنەویستە کە ئەم بەشەی دادگەری شموولی هەموو ئەو شتانە دەکات کە لە دنیادا هەن. چونکە وەك لە "ڕاستیی سێهەم"دا چەسپاندمان: هەموو شتانی ناو ئەم دنیایە داوای هەر شتێك لە بەدیهێنەری شکۆمەندیان بکەن کە بۆ "بوون" و "مانەوەی ژیان"یان پێویستیان بێت، ئیتر ئەم داوا کردنە چ بە زمانی لێهاتنیان بێت و چ بە زمانی پێداویستییە سروشتییەکانیان و چ بە زمانی ناچارییان، ئەوا بە تەرازوویەکی وردی تایبەتی و چەند پێوەرێکی دیاریکراو ئەو خواستەی بۆ دابین دەکرێت و دەیدرێتێ. واتە بە ئەندازەی ئاشکرایی "بوون" و "ژیان" ئەم بەشەی "دادگەری"ش ڕوون و ئاشکرایە.. بەڵام بەشە سەلبییەکە بریتییە لەوەی کە: ناحەقویستان و ستەمکاران تەمێ بکرێن. واتە: بە سزادانی ناحەقویستان حەق ڕاگیر بکرێت و حەقی خۆی بدرێتێ! ئەم بەشەیان هەرچەند بە ڕوونی لەم دنیادا دەرناکەوێت، بەڵام چەندەها نیشانە و ئاماژەی زۆر هەن کە بەڵگەن

ئینکاریی ئەو "میهرەبانی"یەش بکەین کە لـە گشـت جێیەکدا دەیبینین. هـەروەها دەبێ ئـەو هـەموو کـار ڕایـی کردنـە پڕ لـە "دانـایی" و ئیـش و کـارە بـە "کـەرەم" و نیعمەتـە "میـهرەبانی بەخشـانە"ی بەچاو دەیانبینین - خوا نەخواسـتە - بە گاڵتە و گەپ و ستەم و غـەدرێکیان لـە قەڵەم بدەین کە لە ڕاستیدا خوای گەورە تابڵێی بەرز و بڵنـد و دوورە لـەو ڕەفتارانـە و، گـەر وا بێت دەبێ ڕاستییەکان هەڵبگەڕێنەوە، کە ئەوەش ئەوپەڕی بەتاڵ و مەحاڵـە، بـە ڕادەیـەکی ئەوتۆ کە ئەو سۆفستائییانەش ئینکاریی بوونی خۆیانیان دەکرد، بە ئاسانی توخنی ئەم چەشنە مەحاڵانە نەدەکەوتن!

**پوختەی قسە:**

ئەو کارانەی لە دنیادا ڕوودەدەن وەك:

کۆبوونەوە فراوانەکان بۆ "ژیان" و، جیابوونەوە خێراکان بۆ "مردن"..

یەکگرتنە مەزنەکان و، هەڵوەشانەوە بە پەلەکان..

ئاهەنگە مەزنەکان و، دەرەوشانەوە قەشەنگەکان..

هەموو ئەم کارە مەزنانەی لـەم جیهانـەدا دەبینرێن، لەگـەڵ ئـەو ئەنجامـە جوزئـی و ئامانجـە بێنرخـە کـاتی و مـاوە کەمـە دنیاییانـەی بـەرچاوماندا، پەیوەندییـەکی ئـەوتۆیان نییـە کـە شایانی ئەوە بن وابەستەی یەکتر بکرێن. کەواتە پەیوەست کردنی ئەوان بەم ئەنجامـە جوزئـی و کاتییانەی دنیاوە لەگەڵ ژیری و داناییدا یەك ناکەوێت، چونکە ئـەم کـارە وەکـو ئـەوە وایـە کە چەندەها دانایی مەزن و ئامانجی گەورە گەورەی بە ئەندازەی چیایەك وابەستەی بـەردێکی یـەکجار بچکۆلـە و، ئامـانجێکی بێنرخی جوزئـی و کـاتیی بـە قـەدەر بـەردێکی بچووکیـش پەیوەستی چیایەکی سەختی مەزن، بکرێت!!

واتە: نەبوونی پەیوەندیی بوونەوەران و کاروبارەکانی دنیـا بـەو ئامانجەیانـەوە کـە سـەر بـە ژیـانی دنیـان، شـایەتێکی گومـانبڕ و بەڵگەیـەکی ئاشـکرا و ڕوونـە لەسـەر ئەوەی کـە: ئـەم بوونەوەرانە ڕوویان لـە جیهانێکی تری غەیری ئەم دنیا بینراوەیە. چونکـە بەروبوومـە ناسـك و شایانەکانی خۆیان لـەوێ دەبەخشـن و، چاویـان بڕیوەتـە نـاوە جوانـەکانی خـوای گـەورە و، ئامانجەکانیشیان بۆ ئەو جیهانە دەڕوانن و، هەرچەندەش تۆوەکانیان لە ژێر خاکی ئەم دنیایەدا چێنراون و شارراونەتەوە، بـەڵام گـوڵ و بەرهەمـەکانیان لـە جیـهانی میسـالدا دەردەکـەون و

---

لەسەری. وەك: ئـەو زللـەی تـەمێ و قـامچیی سزادانەی کـە ئاراستەی قـەومی عـاد و سـەموود کـران، بگـرە قەومـە یاخییـەکانی ئـەم سـەردەمەش. هـەموو ئەمانـە، بـە چەشـنێکی ئاشـکرا و بێ گومـان، زاڵبـوون و دەسـتەڵاتداریی "دادگەری"ی بەرز و مەزنی خواوەندمان بۆ دەردەخەن. (دانەر)

دەپشکوون. واتە: مرۆڤ بەپێی ئەو لێهاتن و توانایەی پێی دراوە، لێرەدا کردار دەڕوێنێت و لەو دنیاش دروێنەی بەرهەمەکەی دەکات!

بەڵێ، گەر سەیرێکی ئەو ڕووەی بوونەوەران بکەیت کە بۆ "ناوە جوانەکانی خوای گەورە" و "دوارۆژ" دەڕوانن، ئەوا دەبینیت کە:

هەموو "تۆو"ێك - کە موعجیزەی توانستی خواوەندە - بە ئەندازەی درەختێك ئامانجی زۆر و زەبەندەی هەیە..

هەموو "گوڵ"ێك - کە وشەی دانستە[١] - خاوەنی چەندین واتا و ناوەرۆکی ئەوتۆیە کە بە ئەندازەی ژمارەی گوڵەکانی درەخت دەبن..

هەموو بەرێکیش - کە موعجیزەی سنعەت و پارچە هۆنراوەی میهرەبانییە - بە ئەندازەی درەختەکەی، دانایی تێدایە. ئەو ڕووەی بەری درەخت کە لە ئێمەوە دیارە و بریتییە لەوەی ڕۆزیی ئێمەیە، لە ڕاستیدا تەنها یەکێکە لەناو هەزاران داناییدا کە لە بەری هەموو درەختێکدا هەن، چونکە هەر ئەوەندەی ئەرکی سەرشانی تەواو کرد و ناوەرۆکەکەی خۆی ڕاگەیاند، دەمرێت و لەناو گەدەکانماندا ئەسپەردە دەکرێت.

جا مادەم ئەم شتە فانییانە لە جێیەکی تردا بەری خۆیان پێدەگەیەنن و پێشکەشی دەکەن و، چەندین وێنەی هەمیشەیی لەوێ دادەنێن و، چەندەها واتای نەمر و هەتاهەتاییش دەبەخشن و، لەوێ بە تەواوەتی زیکر و تەسبیحاتی هەمیشەیی خۆیان پێ دەبەخشرێت.. ئەوا مرۆڤ تەنها بەوە دەبێت بە مرۆڤی ڕاستەقینە کە سەرنج لەو ڕووە (بەرەو هەمیشەیی ڕوانە)ی ئەو بەدیهێنراوانە بدات. ئەو کاتە، لەناو ئەم "فانی"یانەوە ڕێگایەك دەدۆزێتەوە کە بە "باقی"ی هەمیشەیی بگەیەنێت!

کەواتە، ئەم بوونەوەرانەی کە پەیتا پەیتا کۆ دەبنەوە و پاشان لە یەکتر جیا دەبنەوە و لافاو ئاسا دەڕژێنە ناو گۆمی ژیان و مردنەوە، دەبێ مەبەست و ئامانجێکی تریان تێدا ڕەچاو کرابێت. چونکە بارودۆخی ئەوان - بۆ نموونە - وەك ئەوە وایە کە بۆ نمایش ئامادە کرابن! ئەوەتا مەسرەفێکی یەکجار زۆر بۆ ئامادەکردنی ئەم کۆبوونەوە و لێك جیابوونەوە کەم و

---

(١) گەر دەڵێیت: بۆچی زۆربەی نموونەکانت لە تۆو و، گوڵ و، بەری درەخت دەهێنیتەوە، لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە ئەمانە ناوازەترین و سەرسووڕهێنەرترین و ناسکترینی موعجیزاتی توانستی خوای گەورەن. گومرایان و سروشت پەرستان و شوێنکەوتووانی فەلسەفەی ماددی، لەبەر ئەوەی نەیانتوانی ئەو نووسینە وردانە بخوێننەوە کە قەڵەمی قەدەر و توانستی خوای گەورە لەمانەدا نووسیویانن، گرفتاری سەرگەردانی بوون و، لەناو ئەو تۆو و گوڵ و بەرانەدا نوقم بوون و، کەوتنە لیتاوی چەپەڵی سروشتەوە. (دانەر)

كورتانه خه‌رج ده‌كرێن، تاكو وێنه‌یان بگیرێت و ئه‌و وێنانه‌ش ڕێك بخرێن و پاشان به هه‌میشه‌یی له‌سه‌ر شاشه‌دا پیشان بدرێن.

بەم پێیه، یه‌كێ له ئامانجه‌كانی به‌سه‌ربردنی ژیانی كه‌سی و كۆمه‌ڵایه‌تی له‌م ماوه كه‌م و كورته‌ی دنیادا، ئه‌وه‌یه كه وێنه‌ی ڕووداوه‌كان بگیرێن و ڕێك بكرێن و له‌گه‌ڵ یه‌كتری‌دا پێك بهێنرێن و ئه‌نجامی كرده‌وه‌كانی مرۆڤ بپارێزرێن، تاكو له‌وێ له به‌رده‌م كۆمه‌ڵه هه‌ره مه‌زن و نمایشه یه‌كجار گه‌وره‌كه‌دا پیشان بدرێن و، لێپرسینه‌وه‌یان له‌سه‌ر بكرێت و.. بۆ ئه‌وه‌یشه كه هه‌موو توانا و لێهاتن و به‌هره‌یه‌كی مرۆڤ بۆ شادبوونی به‌و به‌خته‌وه‌ری‌یه هه‌ره مه‌زنه‌ی ئه‌و دنیا ئاماده بكرێن. ئه‌وه‌تا فه‌رمووده‌ی پیرۆزی: "الدنیا مزرعة الآخرة"(١) ئه‌م ڕاستی‌یه ده‌رده‌بڕێت.

جا مادەم ئه‌م دنیایه له واقیعدا هه‌یه و.. ئنجا ئاسه‌واره‌كانی: "دانایی و، چاودێری و، میهره‌بانی و، دادگه‌ری"یان به ئاشكرا پێوه دیاره، ئه‌وا به حه‌تمی و به ئه‌ندازه‌ی چه‌سپاوی و بێ‌گومانیی بوونی دنیا، ئه‌ودنیاش هه‌یه و بێ گومانه.

مادەم هه‌موو شتێكی ئه‌م دنیایه‌ش له ڕوویه‌كه‌وه بۆ ئه‌و دنیا و جیهانی ئه‌وێ ده‌ڕوانێت و ڕووی له‌وێ‌یه، ئه‌وا بێ‌گومان كۆچی ئه‌م گه‌شته‌ی ئێره به‌ره‌و ئه‌وێ‌یه.

كه‌واته ئه‌و كه‌سه‌ی ئینكاریی ئه‌ودنیا ده‌كات، له ڕاستی‌دا ئینكاریی هه‌موو دنیا و شتانی ناو دنیای كردووه!

جا هه‌روه‌ك گۆڕ و ئه‌جه‌ل چاوه‌ڕوانیی مرۆڤ ده‌كه‌ن، به هه‌مان جۆر، به‌هه‌شت و دۆزه‌خیش خۆیان بۆ ئاماده كردووه و چاوه‌ڕوانی گه‌یشتنی ئه‌ون.

## ڕاستیی یازده‌هه‌م
### ده‌رگای: "مرۆڤێتی"
### كه دره‌وشانه‌وه‌ی ناوی: "الحق"ی خوای گه‌وره‌یه

ئایا ده‌گونجێ خواوه‌ندی "حه‌ق" كه په‌رستراوی حه‌ق و ڕاسته‌قینه‌یه، ئه‌م مرۆڤه دروست بكات.. بۆ ئه‌وه‌ی ببێت به:

ڕێز لێگیراوترینی به‌نده‌ی په‌روه‌ردگارێتیی ڕه‌های خۆی و..

(١) (الدنیا مزرعة الآخرة) قال في المقاصد: لم أقف علیه مع إیراد الغزالي له في الإحیاء. وقال القاري: قلت: معناه صحیح مقتبس من قوله تعالى: **﴿من كان یرید حرث الآخرة نزد له في حرثه﴾** (الشورى: ٢٠). بڕوانه: (كشف الخفاء)ی (عه‌جلوونی) فه‌رمووده‌ی ژماره ١٣٢٠. (وه‌رگێڕ).

بۆ پەروەردگاریّتی‌یە گشتی‌یەکەشی بەرامبەر هەموو جیهانەکان، لە هەموو بەدیهێنراوێك گرنگتر بێت و..

لە نێوان بوونەوەرانی گفتوگۆ لەگەڵکراوی خۆیدا لە هەموان زیاتر پەی بە فەرمانەکانی ئەو ببات و لێیان تێبگات و..

لە جوانترین و ڕێکترین شێوە و، بەرزترین نرخ و بایەخدا بێت، بە ڕادەیەك کە بوویێت بە ئاوێنەیەکی ئەوتۆ گشت ناوە جوانەکانی خوای گەورە و.. ناوی هەرە مەزن(الإســـم الأعظـــم) و.. درەوشانەوەی پلەی هەرە گەورەی هەموو ناوە جوانەکانی ئەوی تێدا دەربکەوێت و..

جوانترینی موعجیزاتی توانستی خوا بێت و، ئنجا بۆ مەبەستی زانین و هەڵسەنگاندنی گەنجینەکانی میهرەبانیی خوای گەورە، لە هەموویان کۆئەندام و ئامێر و تەرازووی زیاتری هەبێت و.. لە گشت بەدیهێنراوان هەژارتر و موحتاجتری نیعمەتە لەژمارە بەدەرەکانی خوای گەورە بێت و.. لە هەموویشیان زیاتر ئازاری فەنا و تیاچوون بچێژێت و.. پتر تاسەمەند و موشتاقی مانەوە بێت و.. نەرمونیانی و ناسکی و هەژاری و موحتاجیشی لە هەموویان زیاتر بێت و.. هەرچەندەش لە ڕووی ژیانی دنیاوە لە هەموویان بەدبەختتر بێت، بەڵام لە ڕووی لێهاتنی سروشتی‌یەوە شێوەی لە هەموویان بڵند و بەرزتر بێت..

ئایا دەگونجێ پەرستراوی "حەق" و ڕاستەقینە، "مرۆڤ" بەم چییەتی(ماهیـــة)یە بەدی بهێنێت، پاشـــان بۆ ئەو خانەی هەمیشـــەیی‌یەی نەنێرێت کە ئەمی مرۆڤ شایان و تاسەمەندیەتی و، بەم نەناردنەش "حەقیقەتی مرۆڤێتیی مرۆڤ" بسڕڕێتەوە و، کارێکی پێچەوانەی "ئەحەققییەتی" خۆی بکات؟.. نەخێر.. نەخێر..

ئایا دەچێتە عەقڵەوە کە: فەرمانڕەوای "حەق" و میهرەبانی ڕەها، لێهاتنێکی سروشتیی وا بەرزی بەم مرۆڤە بەخشیبێت بتوانێت ئەو ئەمانەتە هەرە مەزنە بخاتە ئەستۆی خۆیەوە کە ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان نەیانویست هەڵی بگرن، واتە مرۆڤی بە جۆرێکی وا بەدی هێنابێت کە بە: تەرازووە هەندەکی و کارامەیی و لێهاتنە کەم و بچووکەکانی خۆی، لە: سیفەتە گشتگیر و هەمەلایەنە و، کاروبارە هەمەکی و، درەوشانەوە ڕەهاکانی ئەو تێبگات..

ئەو خواوەندەی کە مرۆڤی لە شێوەی نەرمونیانترین و کۆڵەوارترین و لاوازترینی بوونەوەرانی خۆیدا بەدی هێنابێت و، هەموو ئەو بوونەوەرانەشی - بە ڕووەك و ئاژەڵەوە -

بۆ ژێربار خستبێت و ڕام و گوێڕایەڵی کردبن بۆی، بە ڕادەیەك کە ئەمی مرۆڤی کردبێت بە سەرپەرشتیکار و ڕێکخەری تەسبیحات و پەرستشی ئەوان..

ئەو خوایەی کە مرۆڤی - بە چەند پێوەرێکی بچووك - کردبێت بە نموونەیەکی کاروبارەکانی خوای گەورە لە گەردووندا و، بانگەوازکار و ڕاگەیەنەری پەروەردگاریتیی خوای گەورە بە هەموو بوونەوەران، کە پەروەردگاریتییەکی وەهایە بە کردار و گوفتار خاوێنە، بە ڕادەیەك کە پلەیەکی لە مەلائیکەت بالاتری پێ بەخشیبێت و گەیاندبێتیە پایەی: "جێنشینی"..

ئایا دەچێتە عەقڵەوە کە خواوەندی گەورە ئەم هەموو کار و ئەرکانەی بە مرۆڤ بەخشیبێت، بەڵام ئامانج و ئەنجام و بەروبوومەکانی ئەم کار و ئەرکانەی پێ نەبەخشێت کە: "بەختەوەریی هەمیشەیی"یە؟ ئنجا بە نەبەخشینی ئەو بەختەوەرییەش ئەم مرۆڤە بهاوێتە پلەی نزمی: زەلیلی و ڕسوایی و موسیبەت و جۆرەهای نەخۆشی و گیروگرفتەوە و، بیکات بە بەدبەختترینی بەدیهێنراوانی خۆی و، ئەم "ژیری"یەش کە دیارییەکی پیرۆزی نوورانیی دانستی خوا و هۆیەکی ناسینی بەختەوەرییە، بکات بە ئامڕازێکی شوومی ئازار بەخش بۆ مرۆڤ؟ کە ئەمەش دژی دانایی ڕەهای ئەو خواوەندەیە و پێچەوانەی میهرەبانیی فراوانی ئەوە؟.. نەخێر.. نەخێر..

**پوختەی ئەم قسانە:**

هەروەك لە چیرۆکەکەدا بینیمان کە: پلە و، فەرمانبەری و، مووچەی مانگانە و، کار و، کەرەسەکانی ئەفسەرەکە لەناو پێناس و تۆمارەکەیدا نووسرابوون و، بۆمان ڕوون بووەوە کە هەوڵ و تەقالا و کارەکانی ئەو ئەفسەرە لە پێناوی ئەم مەیدانە کاتییەدا نین، بەڵکو لە پێناوی ڕێز و نیعمەت بەخشینەکانی وڵاتێکی بەردەوامی هەمیشەییدان..

بە هەمان جۆریش ئەو لایەنە نیان و ناسکانەی کە وان لە "پێناس"ی دڵی مرۆڤدا و.. ئەو هەست و نەستانەی لە "تۆمار"ی عەقڵی ئەودان و.. ئەو گشت ئامێر و کۆئەندام و کەرەسانەش کە لە سروشتی ئەودا دانراون.. هەموو ئەمانە پێکەوە، ڕوویان لە بەختەوەریی هەمیشەیی کردووە، بەڵکو لە ڕاستیشدا تەنها لە پێناوی ئەو بەختەوەرییە هەمیشەییەدا پێی بەخشراون. ئەمەش ئەنجامێکە کە سەرجەمی لێکۆڵەران و تێکڕای ئەهلی کەشف تیایدا یەکیان گرتووە.

بۆ نموونە: گەر "توانای ئەندێشـە"ی مرۆڤ - کـە یەکێکە لـە هۆکارەکـان و وێنـەگرانی بەردەستی "ژیری"ی مرۆڤ - پێی بوترێت: "دەستەڵات و ئارایشتی هـەموو دنیـا و تەمـەنێکی پتر لە یەك ملیۆن ساڵت دەدرێتێ.. بەڵام دەبـێ بـە حـەتمی لـە ئـەنجامدا بـەرەو نـەمان و نـەبوون برۆیت".. دەبینین "ئەندێشە"ی مرۆڤ - ئەگەر هەوا و ئارەزووی نەفس خۆیان هەڵنەقورتێنن - ئەم ئەنجامی نەمانەی پێ ناخۆشە و گرفتاری پەژارە و خەفەتی دەکات..

واتە: گەورەترین شتی چەشنی دنیا و هەموو شتانی ناوی، گەر ئەنجامەکەی "نەمان" بێت، ئەوا ناتوانێت بچووکترین ئامێرەکانی مرۆڤ تێر بکات، کە ئەندێشەیەتی!

لەمـەوە بـە ڕوونـی دەردەکـەوێت کـە: ئـەم مرۆڤــەی دارای ئـەم هــەموو توانـا و لێهاتنـە سروشتیيانەیە و، خـاوەنی: چـەندەها ئـاواتی تـا ئەبـەد خایەنـە و، بـیر و بۆچوونـی هــەموو گەردوون دەگرێتەوە و، چەندەها ئارەزووی جۆراوجۆریش لە ناخی ئەودا ڕەگیان داکوتـاوە بۆ گشت چەشنەکانی بەختەوەریی هەمیشەیی..

ئەم مرۆڤە، بۆ "هەتاهـەتایی" خولقێـنراوە و، بـە حـەتمییش بـەرەو هەتاهـەتایی و هەمیشـەیی کۆچ دەکات و، ئەم دنیایەش سەبارەت بەو جگە لە "میوانخانەی کاتی" و "هۆڵـی چـاوەڕوان کردنی دواڕۆژ"، هیچی تر نی‌یە.

## ڕاستیی دوازدەهەم

دەرگای: "پێغەمبەرایەتی"(الرسالة) و "نازڵکردنی قورئان"

کە درەوشانەوەی: "بسم الله الرحـــمن الرحیم"ە

ئایـا دەگونجـێ کەسێکی ئـەوتۆ کـە لـە لایـەنی هـەموو پێغەمبەرانـەوە پشـتی گوفتارەکـانی گـیرابێت بـەوەی کـە موعجیزاتیـان تەسـدیقیان دەکـەن.. ڕاستیی دەعواکەشـی گشـت ئـەو پیاوچاك و ئەولیایانە بیسەلمێنن کە ئەوانیش کەشف و کەرامەتەکانیان پشتیان دەگرن.. ئنجـا سەرجەمی ئـەو زانـا و مرۆڤـە دڵ و مێشـك و دەروون خاوێنانـەش شـایەتی لەسـەر ڕاستگۆیی بدەن کە پاڵیـان بـە لێکۆڵینـەوە وردەکانیانـەوە داوە.. ئـەو پێغەمبـەرە ئـازیزەی ﷺ کـە تـا ئـەم ڕادەیە پشتگیر و پاڵپشتی هەبێ و، ئنجا بە هەموو هێز و توانایەکی خۆیشیەوە ڕێی ئاخـیرەت و دەرگـای بەهەشـتی خستبێتە سەرپشـت و، لەمەشـدا هـەزار موعجـیزەی چەسپاوی خـۆی و

هەزاران ئایەتی قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجازیش - کە بە چل ڕوو ئیعجازی چەسپاوە - تەسدیقی بکەن و پشتی بگرن..

ئایا ئیتر دەگونجێ هیچ کام لەو وەهمانەی کە گەلێ لە باڵی مێش لاوازترن، ڕێی قیامەت و دەرگای بەهەشتێك دابخەن کە ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ کردوویەتیەوە و خستوویەتە سەرپشت؟!

* * *

بەم جۆرە و، لەو ڕاستییانەی پێشەوە دەرکەوت: "مەسەلەی حەشر" ڕاستییەکی ڕەگ داکوتاوی ئەوەندە بەهێزە کە هیچ توانا و هێزێك نەتوانێت لەقی بکات و لە جێی خۆیدا بیبزوێنێت، با ئەو هێزە هێندە بەتواناش بێت کە بتوانێت گۆی زەوی بجوولێنێت و لەت و پەتی بکات!

چونکە: خوای گەورە لەسەر داخوازیی: گشت "ناوە جوان" و "سیفەتە مەزنەکانی" خۆی بڕیاری هێنانەدیی ئەو ڕاستییە دەدات و.. پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیشی ﷺ بە هەموو موعجیزات و بەڵگەکانی پێغەمبەرێتییەوە تەسدیقی دەکات و.. قورئانی پیرۆزیش بە گشت ئایەت و حەقیقەتەکانی دەیچەسپێنێت و.. سەرجەمی گەردوونیش بە هەموو ئایەتە تەکوینی و کاروبارە پڕ لە دانستەکانی، شایەتیی لەسەر دەدات..

جا ئایا دەگونجێ هەموو بوونەوەران - جگە لە کافران - لەگەڵ خواوەندی "واجب الوجود"دا لەسەر مەسەلەی هاتنەدیی حەشر یەك بگرن، پاشان گومانێکی یەکجار لاوازی دەستهەڵبەستی شەیتان بێت و بیەوێت لەرزە بەو ڕاستییە چەسپاوە ڕەگ داکوتاوە بخات و لە جێی خۆیدا بیلەقێنێت؟!.. نەخێر.. نەخێر..

هەرگیز وا گومان نەبەیت کە بەڵگەکانی "حەشر" تەنها ئەو دوازدە ڕاستییانە بن کە ئێمە لێیان دواین، بەڵکو قورئانی پیرۆز هەروەك بە تەنها خۆی ئەو ڕاستییانەی فێر کردین، بە هەزاران ڕوو و نیشانەی بەهێزیش ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە بەدیهێنەرمان لەم خانەی فانییەوە بۆ خانەی بەقا و هەمیشەیی دەمانگوێزێتەوە.

هەروەها لەو گومانەشدا نەبیت کە بەڵگەکانی "حەشر" خواستی تەنها ناوە جوانەکانی: "الحكيم و الكريم و الرحيم و العادل و الحفيظ"ی خوای گەورە بن کە ئێمە باسمان کردن، بەڵکو هەموو ناوە جوانەکانی تری خوای گەورە کە لە کارسازیی گەردووندا دەدرەوشێنەوە، داخواز و داواکاری هاتنەدیی دواڕۆژن.

هەروەها گومانیش نەبەیت ئەو ئایەتە گەردوونی‌یانەی بەڵگەی "حەشری دوارۆژ"ن تەنـها ئەوانە بن کە ئێمە هێنامانن، بەڵکو زۆربەی بوونەوەران چەندین ئاسۆ و ڕووی ئەوتۆیان هەیـە کە بە ڕاست و چەپدا دەکرێنەوە و دەڕوانن، جـا هـەروەك ڕوویـەك لـەو ڕوانە دەبێـت بـە بەڵگە و شایەت لەسـەر "بوونـی بەدیهێنـەری مـەزن"، ڕوویـەکی تریـان ئاماژە بـۆ "هاتنـەدیی حەشر" دەکات و پەنجەی بۆ ڕادەکێشێت.

بۆ نموونە:

هـەروەك جوانیـی سنعەتی پڕ لـە وردەکـاریی: بەدیـهاتنی مـرۆڤ لـە جوانـترین شـێوە و بـەنرخترین نـاوەرۆکدا، ئامـاژە بـۆ: "بەدیهێنـەر"ی دەکـات.. ئـەو هـێز و توانـا و لێهاتنـە گشتی‌یانەش کە لە مرۆڤدا هەن و لە ماوەیەکی کەمدا تەواو دەبن و نامێنن، ئاماژە بۆ "حەشر" دەکەن. تەنانـەت گـەر تەنـها یـەك "ڕوو" بـە دوو "ڕوانین"ی جیـا جیـا تەماشـا بکرێـت، ئـەوا بەڵگەی: "بەدیهێنەر" و "حەشر"ی پێکەوە تێدا دەردەکەوێت.

بۆ نموونە:

گەر ماهییەتی کاری: ڕێکخستنی حیکمەت و..

ئارایشتکاریی: چاودێری و..

تەقدیر و هەڵسەنگاندنکاریی: دادگەری و..

نەرمونیانیی: میهرەبانی..

ڕەچاو بکرێن، کە لە زۆربەی شتاندا بە ئاشکرا دەبینرێن، ئەوا دەردەکەوێت کە ئەو شتانە "بەدیهاتووی دەستی دروستکەرێکی: دانا و، کەریم و، دادگەر و، میهرەبانن"..

ئنجا گەر مەزنی و، هێز و، ڕەهایی ئەم سیفەتانەش لەگەڵ: تەمەن کورتـی و، کـەم نرخیـی ئـەم بوونەوەرانـەی دنیـادا پێکـەوە ڕەچاو بکرێـن، ئـەوا "ئاخیرەت" لـە نێوانیـاندا بـە ڕوونـی دەردەکەوێت.

واتە هـەمـوو شـتێك بە زمـانی حـاڵی خۆی: "آمنت بالله وبـالیوم الآخـر" دووپـات دەکاتەوە و لە خۆیشی‌دا هەمان ڕستە بەرجەستە دەکات، تا بینەرانی بیخوێننەوە.

* * *

# کۆتایی

ئەو "دوازدە ڕاستی"یانەی پێشوو، پشتی یەکتر دەگرن و یەکدی تەواو دەکەن و، ئەنجامەکەشیان لە یەکگرتن و کۆی هەموویاندا دەردەکەوێت. ئایا ئیتر دەبێ چ وەهمێك هەبێت بتوانێت ئەم دوازدە شوورا ئاسنینە بەڵکو ئەم دوازدە دیوارە ئەڵماسە، کونـاودەر بکات و ڕێیەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە تا "باوەڕ بە حەشر" لە جێی خۆیدا بلەقێنێت کە بە قەڵایەکی ئاوا سەخت و مەحکەم گەمارۆ دراوە و شووورای بۆ کراوە؟

ئایەتی پیرۆزی: ﴿ما خلقُكُمْ ولا بَعثُكُمْ إلاّ كنفسٍ واحدةٍ﴾ (لقمان:٢٨) ئەوە دەگەیەنێت کە: "بەدیهێنان" و "حەشر"ی هەموو گرۆی مرۆڤ بە لای توانستی خواوەندەوە بە ئەندازەی بەدیهێنان و حەشری تەنها یەك کەسی مرۆڤ ئاسانە.

بەڵێ ڕاستە و هەر وەهایشە، چونکە ئەم ڕاستی‌یە لە باسی "حەشر"ی پەیامی: "خالێك لە نووری ناسینی خوای گەورە"دا درێژەی پێ دراوە. بەڵام وا لێرەدا ئاماژە بۆ پوختەیەکی ئەو باسە دەکەین و نموونەکانی دەهێنین. هەرکەسێکیش درێژەی باسەکەی دەوێت با سەر لەو پەیامە ناوبراوە بدات.

وا نموونەیەك بۆ ئەمە دەهێنینەوە و، وەك وتراویشە: نموونە هێنانەوە قرەوبڕەی لەسەر ناکرێت و قسووری نابینرێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێین: "وللّٰه المَثَلُ الأعلى".

بۆ نموونە: گەر وا دابنرێت "خۆر" بە ویستی خۆی کار بکات، ئەوا بەوپەڕی ئاسانی ڕووناکیی خۆی بۆ تەنها یەك دانە گەردیلە دەنێرێت و، بە هەمان ئاسانییش ئەو ڕووناکی‌یەی خۆی بە هەموو ماددە ڕوون(شـــفّاف)ە لە ژمارە بەدەرەکان دەبەخشێت، ئەمەش بەهۆی نهێنیی "نوورانیێتی"یەوە کە لە هەردوو کیاندا هەیە.

بەهۆی نهێنیی: "ڕوونی"(شفافية)یشەوە، ئەو وێنەیەی خۆر کە بیلبیلەی چاوی یەك دانە گەردیلە وەری دەگرێت، یەکسانە بە وەرگرتنی هەمان وێنە لە لایەن تەختایی فراوانی دەریایەکی مەزنیشەوە.

بەهۆی نهێنیی: "ڕێکوپێکی"یشەوە، منداڵێکی بچووك هەروەك دەتوانێت کەشتی‌یە منداڵانە بچووکەکەی، کە یاریی پێ دەکات، بخاتەگەڕ.. بە هەمان جۆر دەشتوانێت کەشتیی مەزنی ڕاستەقینەش بجووڵێنێت و کاری پێ بکات و بیخاتەگەڕ.

هەروەها بەهۆی نهێنیی: "فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی"یەوە، پێشەوای سوپا دەتوانێت بە فەرمانی: "بڕۆ" یەك سەرباز بخاتە ڕۆیشتن و، هەر بە هەمان وشە و فەرمان سەرجەمی سوپایش بداتەبەر.

ئنجا گەر وا دابنێین تەرازوویەکی یەکجار هەستیار و سەرنەکەری مەزن لە بۆشایی ئاسماندا هەڵواسرابێت و کێشی یەك دانە گوێزیش دەربخات و بیخوێنێتەوە، ئەوا بەهۆی نهێنیی: "هاوسەنگی"یەوە، هەروەك دەتوانرێت دوو خۆر لە "تا"کانیدا دابنرێت و، لە ڕاستیشدا دوو خۆر یان دوو گوێز لە هەردوو "تا"کەیدا دانران، ئەوا ئەو هەوڵەی بۆ بەرز کردنەوەی یەکێك لەو دوو تایە دەدرێت، هەمان هەوڵە بۆ دابەزاندنی ئەوی تریان.

جا مادەم لەناو ئەم بوونەوەر و شتە مومکینە ئاساییانەدا، کە فانی و ناتەواون، بەهۆی: "نوورانێتی و، ڕوونی و، ڕێکوپێکی و، گوێڕایەڵی و، هاوسەنگی"یەوە، گەورەترین شت یەکسان بێت بە بچووکترین و بە چەندەها شتی لە ژمارە بەدەریش، بە ڕادەیەك کە وەك یەك دانە شت وا بن.. ئەوا لە بەردەم توانستی ڕەهای خواوەندی بەتوانادا: کەم و زۆر، بچووك و گەورە، حەشری یەك دانە کەس و سەرجەمی گرۆی مرۆڤ بە یەك هاوار، دەبێ یەکسان بن. ئەمەش بەهۆی: درەوشانەوە نوورانی و ڕەهاکانی: "توانستی خۆیی(ذاتي)ی خوای گەورە"وە کە لەوپەڕی کەماڵدایە و.. بە بۆنەی: "ڕوونی" و "نوورانێتیی" دیوی مەلەکووتی شتان و.. بەهۆی: "ڕێکوپێکی"ی دانایی و توانست و.. "گوێڕایەڵی"ی تەواوەتیی هەموو شتێکەوە بۆ فەرمانە تەکوینییەکانی و.. بەهۆی نهێنیی: "هاوسەنگی"ی هەردوو لای ئیمکانەوە کە بریتییە لە یەکسانیی بوونەوەران لە بوون و نەبوونیاندا.

بەڵێ، پلەکانی "هێز" و "لاوازی"ی هەر شتێك بریتییە لە ئاوێتە بوونی دژەکەی لەگەڵیدا. بۆ نموونە: پلەکانی گەرما بەرهەمی تێکەڵبوونی سەرمایە و، پلەکانی "جوانی"ش ئەنجامی ئاوێتەبوونی ناشیرینییە و، چینەکانی ڕووناکییش هی تێکەڵ بوونی ڕێژەیەکی تاریکییە. بەڵام هەر شتێك گەر خۆیی(ذاتي)بێت - نەك ڕووکەشی و لاوەکی(عرضـــي) - ئەوا دژەکەی هەرگیز ناتوانێت بڕواتە ناویەوە و ئاوێتەی ببێت، دەنا ئەو کاتە دەبێ دوو شتی دژ بە یەکتر لە یەك شتدا کۆ ببنەوە! کە ئەمەش کارێکی مەحاڵە. واتە ئەو شتانەی خۆیی و ئەسڵی و ڕەسەنن، هەرگیز پلەپلە نین.

جا مادەم توانستی خوای گەورە توانستێکی ڕەها و خۆییە و چەشنی مومکینات عەرەزی نییە و دارای کەماڵی ڕەهایە، ئەوا مەحاڵە گرفتاری "کۆڵەواری" ببێت کە دژی

"توانست"ە. واتە بەدیهێنانی "بەهار" سەبارەت بە خواوەندی شكۆمەند بە ئەندازەی بەدیهێنانی "یەك دانە گوڵ" ئاسانە و.. زیندووكردنەوەی سەرجەمی گرۆی مرۆڤیش سەبارەت بە توانستی ئەو، چەشنی ئاسانیی زیندووكردنەوەی یەك كەس وایە. بە پێچەوانەی ئەوەی گەر ئەم كارە بە هۆكارە ماددییەكان بسپێررێت، چونكە ئەو كاتە بەدیهێنانی "یەك دانە گوڵ" بە قەدەر "بەهار" سەخت و پڕ لە گیروگرفت دەبێت.

هەموو ئەو نموونە و ڕوونكردنەوانەی كە هەر لە سەرەتای ئەم پەیامەوە تا ئێرە بۆ: "وێنە" و "ڕاستییەكانی حەشر" باس كران، تەنها لە ڕێژنە(فیض)ی قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراون و، لەبەر ئەوەش هێنران كە: "نەفس" ملكەچی تەسلیم بوون و.. "دڵ"یش ئامادەی وەرگرتن و گوێ ڕاگرتن بێن بۆ "قورئانی پیرۆز". چونكە قسەی تەواوەتی كە هیچ قسەیەكی تری بە دوادا نەیەت، تەنها هی قورئانی پیرۆزە. كەواتە لە ڕاستیدا قسە هەر هی ئەوە و لێدوان و گوفتاریش هەر بۆ ئەوە و مافی ئەوە..

دەبا گوێی لێ ڕابگرین.. "فللّهِ الحجّةُ البالِغة":

**﴿فانظُرْ إلى آثار رَحــمتِ الله كيفَ يُحيِ الأرضَ بعدَ مَوتِها إنّ ذلك لمُحيِ الموتى وهو على كلّ شيءٍ قدير﴾** (الروم:٥٠).

**﴿قالَ مَنْ يُحيِ العِظامَ وَهِيَ رَميم ۞ قُلْ يُحْيِيها الذي أنشأها أوّل مرّةٍ وهو بكــلّ خَلْــقٍ عليم﴾** (يس:٧٨-٧٩).

**﴿يا أيها الناسُ اتّقُوا ربّكُم إنّ زلزلةَ السّاعَةِ شَيْءٌ عظيم ۞ يومَ ترونــها تَذْهَــلُ كُــلُّ مُرضِعةٍ عمّا أرضَعَتْ وتضَعُ كُلُّ ذاتِ حــملٍ حــملها وترى الناسَ سُكارى وماهُم بِسكارى ولكنّ عذابَ الله شديد﴾** (الحج:١-٢).

**﴿اللهُ لا إلهَ إلاّ هوَ لَيَجــمعَنّكُمْ إلى يَومِ القيامَةِ لا ريْــبَ فيــهِ وَمَــنْ أصْــدَقُ مِــنَ اللهِ حديثاً﴾**(النساء:٨٧).

**﴿إنّ الأبْرارَ لفي نعيمٍ ۞ وإنّ الفُجّارَ لفي جَحيم﴾** (الإنفطار:١٣-١٤).

**﴿إذا زُلْزِلَتِ الأرضُ زِلْزالَها ۞ وأخرجَتِ الأرض أثقالها ۞ وقال الإنسان مالها ۞ يومئــذٍ تُحدّثُ أخبارها ۞ بأن ربّك أوحى لها ۞ يومئذٍ يصدرُ النّاسُ أشتاتاً لِيُروا أعمــالهم ۞ فمــن يعملْ مثقالَ ذرّةٍ خيراً يره ۞ ومن يعملْ مثقال ذرّةٍ شرّاً يره﴾** (سورة الزلزلة).

**﴿القارِعَةُ ۞ ما القارعةُ ۞ وما أدراكَ ما القارعةُ ۞ يومَ يكونُ النّاسُ كالفَراشِ المبثوثِ ۞**

وتكونُ الجبالُ كالعِهنِ المنفوشِ ۞ فأمّا مَنْ ثَقُلتْ موازينهُ ۞ فهو في عِيشةٍ راضيةٍ ۞ وأمّا مَنْ خفّتْ موازينه ۞ فأمّهُ هاوية ۞ وما أَدراكَ ماهيه ۞ نارٌ حامية﴾ (سورة القارعة).

﴿ولله غَيبُ السَّموات والأَرضِ وما أَمْرُ السّاعَةِ إلاّ كَلَمْحِ البَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ إنَّ اللهَ على كُلِّ شيءٍ قدير﴾ (النحل:٧٧).

* * *

بەڵێ، با گوێ لەم جۆرە ئایەتە ڕوونانەی قورئانی پیرۆز ڕابگرین و پڕ بەدڵ بڵێین: "آمنّا وصدَّقنا"..

آمنت بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وبالقدر خيره وشرّه من الله تعالى. والبعث بعد الموت حقٌّ، وان الجنة حقٌّ، والنار حقٌّ، وانّ الشفاعة حقٌّ، وان منكراً ونكيراً حقٌّ، وانّ الله يبعث من في القبور. أشهد أن لا إله إلاّ الله وأشهد أنّ محمداً رسول الله ﷺ.

اللّهم صلّ على ألطف وأشرف وأكمل وأجمل ثمرات طوبى رحمتك الذي أرسلتَه رحمةً للعالمين ووسيلةً لوصولنا إلى أزين وأحسن وأجلى وأعلى ثمرات تلك الطوبى المتدلية على دار الآخرة، أي: الجنّة.

اللّهم أجرنا وأجر والدينا من النار وأدخلنا وأدخل والدينا الجنّة مع الأبرار بجاه نبّيك المختار.. آمين.

* * *

● ئەی ئەو برایەی کە بە ویژدانەوە ئەم پەیامە دەخوێنیتەوە!

هەرگیز مەڵێ: "لەم وتەی دەهەمە تێناگەم".. برام! خەم مەخۆ و دڵتەنگی تێنەگەیشتنی تەواوەتیی خوێندنەوەی ئەم پەیامە مەبە، چونکە چەندین فەیلەسووفی بلیمەتی وەك "ئیبن سینا" وتوویانە: "**الحشرُ ليس على مقاييس عقلية**" واتە: "مومكین نیيە بە عەقڵ ڕێی حەشر بگیرێتە بەر هەرچەند ئیمانیشمان پێیەتی". هەروەها زانایانی ئیسلام لەوەدا یەکیان گرتووە کە: کێشەی حەشر بابەتێکی نەقلیيە، واتە بەڵگەکانی تەنها بە نەقڵ چەسپاون و ناکرێ بە عەقڵ بچەسپێت! کەواتە گرتنەبەری ڕێگایەك کە تابڵێی قووڵ بێت و لە هەمان کاتدا یەکجار

بەرز و بڵندیش بێت، هەرگیز وەك گرتنەبەری ڕاستە شەقامێكی گشتیی وا نابێت كە بكرێ هەموو ڕێبوارێك پیایدا گوزەر بكات و بیگرێتە بەر.

بەڵام بەهۆی بەرەكەت و ڕێژنەی قورئانی پیرۆز و، بەزەیی بەدیهێنەری میهرەبانەوە، ئا لەم چەرخەدا كە "تەقلید"ی تێدا وردوخاش بووە و ملكەچی و تەسلیم بوونیشی تێدا تێكچووە و لە جێی خۆیدا نەماوە، ئێمە - ئا لەم چەرخەدا كە حاڵی وایە - منەتباری گرتنەبەری ئەم ڕێگا قووڵ و بەرزە كراین..

كەواتە دەبێ هەزاران سوپاسگوزاری و شوكرانە پێشكەشی بەدیهێنەری مەزن بكەین، لەسەر ئەو چاكە فراوان و فەزڵە گەورەیەی كە بەرامبەرمان نواندی. چونكە ئەم ئەندازەیە سەروزیادی ڕزگاركردن و ساغ بوونی ئیمانەكەمانە. لەبەر ئەوە، دەبێ بە ئەندازە و بڕی تێگەیشتنەكەمان ڕازی ببین و، پاشان بە دووپاتكردنەوەی خوێندنەوەشی ئەو ڕادەیە پتر بەرز بكەینەوە.

ئنجا یەكێك لە هۆكارەكانی نەگەیشتنی مرۆڤ بە مەسەلەی حەشر لە ڕێی عەقڵەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە: حەشری هەرە مەزن یەكێكە لە درەوشانەوەكانی "ناوی هەرە مەزنی خوای گەورە".. لەبەر ئەم هۆیە، ئەوا تەنها "بینین" و "پیشاندان"ی كارە مەزنەكانی درەوشانەوەی: "ناوی هەرە مەزن" و "پلەی هەرە گەورەی یەك بە یەكی ناوە جوانەكانی خوای گەورە"یە كە چەسپاندنی "حەشری هەرە مەزن" بە چەشنی چەسپاندن و بێ گومانیی "حەشری بەهار" ئاسان دەكات و، مرۆڤ دەگەیەنێتە تەسلیم بوونی یەكجارەكی و تەواوەتی و ئیمانی تەحقیقی.

جا بە بەرەكەتی قورئانی پیرۆز، لەم وتەی دەهەمەدا مەسەلەی حەشر لەم ڕێ یەوە ڕوون كرایەوە. دەنا گەر "عەقڵ" پشتی بە پێوەر و تەرازووە كول و كاسەكانی خۆی ببەستایە، ئەوا بە كۆڵەواری و دەستەوسانی دەمایەوە و، ناچاری "تەقلید" و چاولێكەری دەبوو!

* * *

## پاشكۆكانی پەیامی حەشر

### پارچەی یەكەم و گرنگی پاشكۆی پەیامی حەشر

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿فَسُبحانَ الله حينَ تُمْسونَ وَحينَ تُصْبِحون ﴿ ولَهُ الْحَمْدُ في السَّموات والأَرْضِ وَعَشِـــيّاً وَحينَ تُظْهِروُنَ ﴿ يُخْرِجُ الحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الحَيِّ وَيُحْيِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِـــها وَكَذلِكَ تُخْرَجوُنَ ﴿ وَمِنْ آياتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُراب ثُمَّ إِذا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِروُنَ ﴿ وَمِنْ آياتِـــهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْواجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ في ذلِكَ لآيـات لِقَوْمٍ يَتَفَكَّروُن ﴿ وَمِنْ آياتِهِ خَلْقُ السَّمـــوات وَالأَرْضِ وَاخْتِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوانِكُـــمْ إِنَّ في ذلِكَ لآيات لِلعَالِمين ﴿ وَمِنْ آياتِهِ مَنَامُكُمْ بِالَّيْلِ وَالنَّهارِ وَابْتِغَاؤكُمْ مِنْ فَضْلِـــهِ إِنَّ في ذلِـكَ لآيات لِقَوْمٍ يَسْمَعُون ﴿ وَمِنْ آياتِهِ يُريكُمُ البَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً وَيُنَزِّلُ مِنَ السَمـــــاءِ مـــاءً فَيُحْيِي بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهـــا إِنَّ في ذلِكَ لآيات لِقَوْمٍ يَعْقِلُون ﴿ وَمِنْ آياتِهِ أَنْ تَقُومَ السَمـــاءُ وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِذا دَعـــاكُمْ دَعْوَةً مِنَ الأَرْضِ إِذا أَنْتُمْ تَخرُجُون ﴿ وَلَهُ مَنْ في السَّمـــوات وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَهُ قَانِتُونَ ﴿ وَهُوَ الذِّي يَبْدَؤُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ وَلَهُ الْمَثَلُ الأَعْلـــى في السَّمـــواتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزيزُ الْحَكيمُ﴾ (الروم:١٧-٢٧).

ئەم ئايەتە پیرۆزانە بە خەستوخۆڵی مەسەلەی "حەشر" ڕوون دەكەنەوە، كە جەمسەر و تەوەرەی ئیمانە.

ئێمەش لەم "تیشكی نۆهەم"ەدا بەڵگەیەكی بەهێز و مەزنی ڕوونكردنەوەی ئەم ئایەتانە و یەكێك لە بەڵگە بەرز و پیرۆزەكانی ئەم مەسەلەیە باس دەكەین.

ئه‌مه‌ش – له‌ ڕاستی‌دا – عینایه‌ت و ئاوڕ لێدانه‌وه‌یه‌كی نه‌خشین و جوانی په‌روه‌ردگاره‌، چونكه‌ "سه‌عیدی كۆن" سی ساڵ پێش ئێستا له‌ كۆتایی ئه‌و كتێبه‌ی كه‌ ناوی: "محاكمات"ه‌ و پێشه‌كیی ته‌فسیری: "إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز"ه‌، ئه‌مه‌ی خواره‌وه‌ی نووسی:

"مه‌به‌ستی دووهه‌م: ئه‌م مه‌به‌سته‌ ته‌فسیری دوو ئایه‌ت ده‌كات كه‌ "حه‌شر" ڕوون ده‌كه‌نه‌وه‌ و ئاماژه‌ی بۆ ده‌كه‌ن".

به‌ڵام ئه‌م باسه‌ ناوبراوه‌ به‌وه‌ ده‌ستی پێ كرد كه‌ نووسیی: "نخو[1] : بسم الله الرحمن الرحيم". ئیتر له‌ نووسین ڕاوه‌ستا و بۆی نه‌كرا ته‌واوی بكات.

وا ئێستا هه‌زار و یه‌ك جار و به‌ ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی به‌ڵگه‌ و نیشانه‌كانی حه‌شر، شوكر و سوپاس و ستایش بۆ به‌دیهێنه‌ری به‌خشنده‌م كه‌ دوای تێپه‌ڕبوونی ماوه‌ی "سی" ساڵ به‌سه‌ر ئه‌و نووسینه‌دا، یارمه‌تیی دام ئه‌و ته‌فسیره‌ ڕوون بكه‌مه‌وه‌، ئه‌وه‌بوو دوای "ده‌" ساڵ خواوه‌ند نیعمه‌تی ته‌فسیر كردنی ئایه‌تی یه‌كه‌می پێ به‌خشیم، كه‌ بریتی‌یه‌ له‌ ته‌فسیری ئایه‌تی: ﴿**فانظر إلى آثارِ رَحْمَتِ اللهِ كَيْفَ يُحيِ الأرضَ بَعْدَ موْتِها إنَّ ذلِكَ لَمُحْيِ الموتى وَهُوَ على كُلِّ شَيْءٍ قديرٌ**﴾ (الروم: ٥٠) و، بوو به‌ "وته‌ی ده‌هه‌م" و "وته‌ی بیست و نۆهه‌م" كه‌ دوو به‌ڵگه‌ی ڕوون و به‌هێزی ئه‌وتۆن ئینكاری وملنه‌دانی سه‌رسه‌خته‌كانیان لاڵ و بێ‌ده‌نگ كرد.. ئنجا "ده‌" ساڵ دوای ڕوونكردنه‌وه‌ی ئه‌و قه‌ڵا پۆڵایینه‌ش، خواوه‌ندی مه‌زن نیعمه‌تی ته‌فسیر كردنی ئه‌و ئایه‌تانه‌ی پێ به‌خشیم كه‌ له‌ سه‌ره‌تای ئه‌م تیشكه‌دان و، ئه‌م په‌یامه‌ی لێ پێكهاتووه‌. جا ئه‌م "تیشكی نۆهه‌م"ه‌ بریتی‌یه‌ له‌ "نۆ" مه‌قامی به‌رز كه‌ ئه‌م ئایه‌تانه‌ ئاماژه‌یان بۆ كردوون، له‌گه‌ڵ "پێشه‌كی"یه‌كدا.

* * *

(١) نخو: وشه‌یه‌كه‌ به‌ ڕێنچكه‌ زمانی كرمانجیی ژووروو، به‌ واتای: "كه‌واته‌" دێت له‌ ڕێنچكه‌ زمانی كرمانجیی خواروودا. (وه‌رگێڕ)

## پێشەکی

**(ئەم پێشەکی‌یە دوو خاڵە: لە سەرەتادا بە پوختی لە نێوان ئەنجام و سوودەکانی "باوەڕ بە حەشر" بۆ ژیان و گیانی مــرۆڤ، ئەنجامێــکی گــەورە و گرنــگ بـاس دەکەین و، مەودای پێویستیی ئەم باوەڕەش بۆ ژیانی مرۆڤایەتی - بە تایبەت لە بوارە کۆمەڵایەتی‌یەکەی‌دا - ڕوون دەکەینەوە.**

**هەروەها لە نێوان بەڵگە زۆر و زەبــەندەکانی"بـاوەڕ بـە حەشـر"دا تەنـها یـەك بەڵگە دەهێنین و، ڕوونــی و ئاشـکرایی ئـەم بـاوەڕە دەخەینـە پێش‌چـاو کـە هیــچ گومانێکی ئاوێتە نابێت).**

### خاڵی یەکەم

وا بۆ نموونە لە نێوان سەدان بەڵگەدا، ئاماژە بۆ تەنها چوار دانـە لـەو بەڵگانـە دەکـەین کـە دەیچەسپێنن: "بــاوەڕ بــە ڕۆژی دوایــی" گرنگــترین بــەردی بناغــەی ژیــانی تاکەکەســی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤە و، بنچینەی هەموو کەماڵات و ڕەوشت‌بەرزی و بەختەوەری‌یەکانیەتی:

**بەڵگەی یەکەم:**

"**منــاڵان**" کـە نیـوەی گـرۆی مـرۆڤ پێکدەهێنــن، ئەگــەر هێــزی مەعنــەویی "ئیمــان بــە بەهەشـت" نـەبێت کـە لـە دەروون و بوونـی ناسـك و لاوازی خۆیـاندا هەسـتی پـێ دەکـەن، ناتوانن ئەو بارە ناخۆشانەی چەشنی "مردن" هەڵبگرن کە لـە پێش چاویـاندا ڕوو دەدەن و بـە ڕواڵەت خەمناك و بە ئازار دیارن. ئەم ئیمانەیان بە بەهەشت دەرگای ڕوونی هیوا و ئاوات لە بەردەم سروشتە ناسکەکانی ئـەواندا دەکاتـەوە کـە هێنـدە ناسـك و نیانـە توانـای بـەرگری‌یان نی‌یە و، بـە بچووکـترین گـیروگرفت دڵیـان گـەرد دەگرێـت و دەدەنـە پرمـەی گریـان. بــەڵام بەهۆی ئەم ئیمانەوە، کە لە دڵیاندا چەکەرەی کردووە، دەتوانــن بـە خۆشـی و شـادی ژیـان و گوزەرانیان بەسەر بەرن. چونکە هەر مناڵێك کە باوەڕی بە بەهەشت ببێت، لەبەر خۆیەوە بـە خۆی دەڵێت: (برا بچووکەکەم، یان هاوڕێ خۆشەویستەکەم کە کۆچی دوایی کرد، ئێسـتا یەکێکـە لـە باڵندەکـانی بەهەشــت. کەواتـە ئـەو بـە سەربەسـتی لـە بەهەشـتدا گەشـتی خـۆی دەکـات و دەحەوێتـەوە و، ژیـانی ئێستای ئـەو لـەوێ لـەچاو گوزەرانـی ئێمـە لـێرەدا، گەلـێ باشترە).

دەنا گەر ئەوان ئەم ئیمانەیان بە بەهەشت لەدەست دابێت، ئەوا ئەو مردنەی کە دووچاری منالآنی وەك خۆیان و گەورەکانیش دەبێت، ورەی ئەو منالە بێتوانا و دەستەلآتانەی بەردەدا و بەفەلاکەتی دەبردن و، گشت لایەنە دەروونی‌یەکانیان و تێکڕای ژیانی ئەوانی تێکدەشکاند و، ڕووناکیی ژیانیشیان بە تەواوی لێڵ و تاریك دادەهات. ئەو کاتەش، هاودەم لەگەڵ فرمێسکی چاوەکانیاندا، بە خوڕ ئەسرینی بەسۆیان لە سەرچاوەی "گیان" و "دڵ" و "ژیری"یشیانەوە هەڵدەڕشت و، لە ئەنجامی ئەم ئاکامە ناکامەشەوە یان سەرجەمی هەستەکانیان دەمرد و پڕ ئەستوور دەبوون و سۆزەکانی ناخیان بەجارێ لەکار دەکەوتن.. یاخود چەشنی ئاژەڵی بەدبەخت وێڵ و سەر لێ شێواو دەبوون و سەرگەردان دەردەچوون.

**بەڵگەی دووهەم:**

"**پیران**"یش کە نیوەی گرۆی مرۆڤن و لەسەر لێواری گۆڕەکانیان ڕاوەستاون، تەنها "ئیمان بە دواڕۆژ"ە کە ئارامی‌یان پێ دەبەخشێت. ئەو مرۆڤە پیرانە ئارامی و دڵدانەوەی خۆیان بەرامبەر بە نزیك بوونەوەی وادەی کوژانەوەی ژیانە ئازیزەکەیان و داخستنی دەرگای دنیا شیرین و جوانەکەیان لە ڕوویاندا، تەنها لەو ئیمانەدا دەبیننەوە.. جا ئەو پیرانەی کە وەك منالیان لێ هاتووەتەوە و هەستی گیان و سروشتیان بەجارێ ناسك بووەتەوە، تەنها بە هیوامەندیی ژیانی دواڕۆژەوەیە کە ئارام دەگرن و بەرگریی ئەو نائومێدی‌یە جەرگبڕانەی پێ دەکەن کە لە مردن و نەمانەوە پەیدا دەبن.

دەنا گەر ئەم "ئیمان بە دواڕۆژە" نەبێت، ئەوا ئەو باوك و دایکە پیرانەی کە لە هەموو کەسێك زیاتر شایانی شەفەقەت و بەزەیی و میهرەبانین و لە هەموو کەسیش زیاتر پێویستیان بە ئاسایش و ژیانێکی پڕ لە هێمنی هەیە، لە ناخی "دڵ" و "دەروون" و "گیان"ی خۆیاندا هەستیان بە دڵەتەپێ و کسپەی گیان و شڵەژاویی دەروون دەکرد و، ئەم دنیا فراوانەیان بەجارێ لێ دەهاتەوە یەك و لێیان دەبوو بە بەندیخانەیەکی ترسناك و، تێکڕای ژیانیشیان دەبوو بە ئازارێکی سەخت و بەسۆ.

**بەڵگەی سێهەم:**

"**لاوان**" و "**هەرزەکاران**" کە جەمسەری ژیانی کۆمەڵایەتین، جگە لە "مەترسیی ئاگری دۆزەخ" هیچ شتێکی تر نی‌یە قوڵپەقوڵپی هەستەکانیان هێمن بکاتەوە و دەستیان لە ستەم و دەستدرێژی و کاولکاری بگێڕێتەوە و بەرەنگاری هەڵەشەیی هەوا و ئارەزوویان ببێتەوە و لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی‌یاندا ڕەوتی هەرەباشیان بۆ دابین بکات.

خۆ ئەگەر ئەم ترسەی ئاگری دۆزەخ نەبوایە، ئەوا ئەو هەرزەکارە هەڵەشانەی کە مەستی هەوا و ئارەزووەکانیانن، دنیایان لە پیر و پەككەوتە و لاوازان دەکرد بە دۆزەخ. چونکە ئەو

کاتە دەستەڵاتی ناو کۆمەڵ دەکەوتە دەستی زاڵ بووانی وەك ئەوان و، ئنجا ژیانی بەرز و بڵندی مرۆڤایەتی‌یان دادەبەزاندە ئاستێکی نزمی ئاژەڵانە.

**بەڵگەی چوارەم:**

ژیانی ناو **"خێزان"**یش مایەی کۆبوونەوە و، بەهەشتی بەختەوەری و، قەڵای مەحکەم و، داڵدەی بێوەیی ژیانی دنیایە.. ماڵی هەموو کەسێك، کە جیهان و دنیای تایبەتیی ئەو کەسەیە، ئەگەر ڕێز لە یەك گرتنی ڕاست و چون یەك و، وەفای بێ گەردی نێوان هەموان و، بەزەیی و میهرەبانیی ڕاستەقینەی تا ڕادەی خۆبەختکردن و خۆنەویستیی تێدا نەبێت، ئەوا هەرگیز ئەو ماڵە بەختەوەری لە گیانی خۆیدا نابینێت. خۆ ئەگەر کەسانی ئەو خێزانە ئیمانیان بە بوونی چەندین پەیوەندیی هاوەڵانەی هەمیشەیی و بەردەوامی کاتێکی بێ کۆتایی و ژیانێکی هەتاهەتایی بێ سنوور نەبێت، کە پەیوەندیی بەرز و بەڕێزی باوکایەتی و برایەتیی بێ گەرد و هاوەڵێتیی خاوێنی بەوەفایانە بیانبەستێت بە یەکەوە، ئەوا ئەم ڕێزگرتنە بێ گەرد و وەفا و میهرەبانی‌یە چون یەکەش لەم دنیایاندا دروست نابێت.

ئەگەر ئەم چەشنە پەیوەندی‌یە لە نێوان کەسانی خێزاندا هەبوو، ئەوا "مێرد" لە بەرخۆیەوە بە خۆی دەڵێت: (ئەم ژنەم هاوسەری ژیانمە و هاوڕێی جیهانی هەمیشەیی و ژیانی نەمرمە. کەواتە گوێ نادەم بەوەی کە ئێستا پیر و چرچ و ناشیرین بووە، چونکە جوانی‌یەکی هەمیشەیی لەمەولا لە ڕێدایە. لەبەر ئەوە، ئامادەم ئەوپەڕی داخوازی‌یەکانی وەفا و میهرەبانیی لە ڕوودا بنوێنم و هەر چەشنە خۆبەخت کردنێك لە پێناوی ئەم هاوەڵێتی‌یە هەمیشەیی‌یەدا پێویست بێت، بێ سێ و دوو کردن و دوودڵی، بەختی بکەم).

بەم جۆرە، ئەم پیاوە دەتوانێت وەك چۆن حەزی لە حۆریی بەهەشتە و خۆشی دەوێت، ئاوا بەزەیی بە ژنە پەك کەوتە و بەساڵاچووەکەی خۆیشی‌دا بێتەوە و خۆشەویستیی لە ڕوودا بنوێنێت. دەنا هاوەڵێتی‌یەکەی لەگەڵ خێزان و هاوسەرەکەی‌دا هاودەمی‌یەکی کاتی و ڕواڵەتیی سەعات و دوو سەعات دەبێت کە جودایی هەمیشەیی بە دوادا دێت، هاوەڵێتی‌یەکی سەرزارەکی دەبێت و هیچ پشتگیر و بناغەیەکی نابێت و، ئنجا بەزەیی‌یەکی مەجازی و، ڕێزێکی درۆینە و، سۆزێکی هەڵقوڵاوی هەستی ئاژەڵانە نەبێ هیچی تر نابەخشێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بەرژەوەندی و هەستە شەهوانی‌یە دەروونی‌یەکان خۆیان لەو بەزەیی و ڕێزەدا هەڵدەقورتێنن و، ئەو بەهەشتە دنیایی‌یە دەکەن بە دۆزەخێکی ئەوتۆ کە لە توانادا نەبێ ئارامی لەسەر بگیرێت.

بەم جۆرە، گەر تەنها یەك ئەنجام لە نێوان سەدان ئەنجامی "باوەڕ بە حەشر"دا کە پەیوەندیی بە ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤەوە هەیە و سەدان ڕوو و سوودی هەمە جۆرەی لێ

ده‌بێته‌وه‌، له‌سه‌ر ئه‌و چوار به‌ڵگانه‌ی ئێستا باس كران قیاس بكرێت، ئه‌وا ده‌زانرێت كه‌ هاتنه‌دیی ڕاستیی "حه‌شر" به‌ ئه‌ندازه‌ی چه‌سپاویی ڕاستیی به‌رزی مرۆڤ و پێداویستی‌یه‌ هه‌مه‌كی‌یه‌كانی، چه‌سپاوه‌. ته‌نانه‌ت پێویستیی "گ.ده‌" بۆ خۆراك و شایه‌تی‌دانی له‌م ڕێیه‌وه‌ له‌سه‌ر ئه‌و خوارده‌مه‌نی‌یانه‌ چه‌نده‌یه‌ و تا چ ڕاده‌یه‌كه‌، ئه‌و پێداویستی‌یه‌ هه‌مه‌كی‌یانه‌ی مرۆڤیش به‌ڵگه‌یه‌كی گه‌لێ ڕوونتر و شایه‌تی‌یه‌كی گه‌لێ ئاشكراترن له‌سه‌ر هاتنه‌دیی "حه‌شر".

ده‌توانرێت به‌ چه‌شنێكی قووڵتر مه‌ودای هاتنه‌دیی "حه‌شر" ده‌ستنیشان بكرێت گه‌ر ئه‌م ڕاستی‌یه‌ (واته‌: حه‌شر) له‌ مرۆڤایه‌تی بسێنرێته‌وه‌ و لێی بێبه‌ش بكرێت، چونكه‌ ئه‌و كاته‌ چییه‌تیی به‌رز و گرنگ و زیندووی مرۆڤ ده‌گۆڕێت و ده‌بێت به‌ كه‌لاكێكی بۆگه‌نی مه‌ڵبه‌ندی میكرۆبه‌كان!

ده‌با زانایانی كۆمه‌ڵناسی و ڕامیاری و ڕه‌وشتناسی له‌وانه‌ی كه‌ بایه‌خ به‌ كاروباری كۆمه‌ڵ و ڕه‌وشتی مرۆڤ ده‌ده‌ن، گوێ له‌مه‌ ڕابگرن و، با بێن و پێمان بڵێن به‌ چی ئه‌م بۆشایی‌یه‌ پڕ ده‌كه‌نه‌وه‌ و به‌ چ چاره‌سه‌ری‌یه‌ك تیماری ئه‌م زامه‌ قووڵ و به‌سۆیانه‌ی مرۆڤ ده‌كه‌ن؟!

## خاڵی دووهه‌م

ئه‌م خاڵه‌، زۆر به‌ كورتی، له‌ نێوان چه‌ندین به‌ڵگه‌ی له‌ژماره‌به‌ده‌ری "ڕاستیی حه‌شر"دا ته‌نها یه‌ك به‌ڵگه‌ ڕوون ده‌كاته‌وه‌، كه‌ پوخته‌ی شایه‌تی‌دانی پایه‌كانی تری ئیمانه‌. ئه‌ویش به‌م جۆره‌ی خواره‌وه‌:

سه‌رجه‌می هه‌موو ئه‌و موعجیزانه‌ی كه‌ به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌رێتیی حه‌زره‌تی محه‌مه‌د ﷺ هه‌روه‌ها گشت به‌ڵگه‌كانی تری پێغه‌مبه‌رێتی و ڕاستگۆیی ئه‌و، هه‌موویان پێكه‌وه‌ شایه‌تی له‌سه‌ر ڕاستیی حه‌شر ده‌ده‌ن و به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ری و ده‌یچه‌سپێنن، چونكه‌ بانگه‌وازه‌كه‌ی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ ئازیزه‌ ﷺ له‌ درێژایی ژیانی‌دا پاش مه‌سه‌له‌ی "ته‌وحید" ئاراسته‌ی مه‌سه‌له‌ی "حه‌شر" كراوه‌. هه‌روه‌ها هه‌موو ئه‌و به‌ڵگه‌ و موعجیزانه‌ی ئه‌م پێغه‌مبه‌ره‌ ﷺ كه‌ ده‌بن به‌ به‌ڵگه‌ی ڕاستیی پێغه‌مبه‌ران و ئه‌وه‌نده‌ به‌هێزن كه‌ خه‌ڵكی بۆ ته‌سدیقیان هان ده‌ده‌ن، هه‌موویان شایه‌تی له‌سه‌ر هه‌مان ڕاستی ده‌ده‌ن كه‌ بریتی‌یه‌ له‌ "حه‌شر"..

هه‌روه‌ها شایه‌تی‌دانی ئه‌و كتێبانه‌ی كه‌ له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه‌ بۆ مرۆڤ ڕه‌وانه‌كراون و شایه‌تی‌دانی پێغه‌مبه‌ره‌ به‌ڕێزه‌كانیان ڕوون كردووه‌ته‌وه‌ و گه‌یاندوویانه‌ته‌ پله‌ی "به‌داهه‌ت" هه‌ردووكیان پێكه‌وه‌[1] شایه‌تی له‌سه‌ر هه‌مان ڕاستی ده‌ده‌ن، به‌م چه‌شنه‌ی خواره‌وه‌:

---

(١) واته‌ پێغه‌مبه‌ران و ئه‌و كتێبانه‌ی خوای گه‌وره‌ بۆی ناردوون. (وه‌رگێڕ)

لە پێش هەموویانەوە قورئانی پیرۆزی خاوەن ڕوونکردنەوەی پڕ لە ئیعجازە، ئەم قورئانە پیرۆزە بە هەموو موعجیزە و بەڵگە و ڕاستی‌یەکانیەوە کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی لە هەموو کتێبێك شایانتری شوێن کەوتنە، شایەتی لەسەر ڕوودانی حەشر دەدات و دەیچەسپێنێت. چونکە سێ‌یەکی هەموو قورئان و سەرەتای زۆربەی کورتە سوورەتەکانی بریتین لە چەندین ئایەتی ڕوون و ئاشکرای ئەوتۆ کە بەڵگەن لەسەر هاتنەدیی "حەشر". واتە قورئانی پیرۆز بە هەزاران ئایەتی پیرۆزی خۆی چ بە ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوی و چ بە ئاماژە بۆ کردن، هەواڵی هەمان ڕاستی ڕادەگەیەنێت و بە ڕوونی دەیچەسپێنێت و ئاشکرای دەکات. بۆ نموونە:

﴿إذا الشمسُ كُوِّرَتْ﴾ (التكوير:١).

﴿ياأيّها الناسُ اتَّقوا ربَّكُمْ إنّ زَلزلةَ السَّاعةِ شَيْءٌ عظيم﴾ (الحج:١).

﴿إذا زُلْزِلَتِ الأرْضُ زِلْزالَها﴾ (الزلزلة:١).

﴿إذا السماءُ انفطرت﴾ (الإنفطار:١).

﴿إذا السماءُ انشقَّتْ﴾ (الإنشقاق:١).

﴿عَمَّ يتساءَلون﴾ (النبأ:١).

﴿هل أتاكَ حديثُ الغاشيةِ﴾ (الغاشية:١).

قورئانی پیرۆز بەم ئایەتانە و هاوچەشنیان لە سەرەتای نزیکەی چل سوورەتی‌دا، دەیچەسپێنێت کە حەشر شتێکی بێ‌گومانە و ڕووداوێکی گەردوونی‌یە لەوپەڕی گرنگی‌دا و، دەبێ ببێت و، ڕوودانیشی گەلێ پێویستە.. بە ئایەتەکانی تریشی چەندین بەڵگەی جۆراوجۆری قەناعەت بەخش لەسەر ئەم ڕاستی‌یە ڕوون دەکاتەوە.

ئایا کتێبێك کە تەنها یەك ئاماژەی تەنها یەك ئایەت لە ئایەتەکانی هەموو ئەو ڕاستی‌یە زانستی و گەردوونی‌یانە بەرهەم بهێنێت کە پێیان دەوترێت: "زانستە ئیسلامی‌یەکان"[1]، دەبێ شایەتی دانی هەزاران ئایەتی ئەو کتێبە کە "ئیمان بە حەشر" وەك خۆری درەخشان ڕوون دەکەنەوە، چۆن بێت؟! ئایا ئینکاری کردنی ئەم ئیمانە وەك ئینکاری کردنی خۆر یان ئینکاری کردنی تێکڕای بوونەوەران نی‌یە؟ ئایا ئەم کارە کارێکی سەد دەر سەد مەحاڵ و نەگونجاو نی‌یە؟

ئایا دەگونجێ هەزاران بەڵێن و هەڕەشە و گوفتاری پادشایەکی مەزنی بەدەسەڵات بە درۆ دابنرێت و بە شتێکی بێ بناغە و دوور لە ڕاستی لە قەڵەم بدرێت، لە کاتێکدا کە سوپای ئەو

(١) لام وایە مەبەستی دانەر ئاماژەی ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿وعلّمَ آدَمَ الأسماءَ كُلَّها﴾ (البقرة:٣١).
(وەرگێڕ)

پادشایه جاری وا هه‌یه ته‌نها له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئاماژه‌یه‌كی پادشا به‌ درۆ نه‌خرێته‌وه‌، ده‌چێته‌ ناو جه‌نگی بێ ئامانه‌وه‌؟

خۆ پادشای مه‌عنه‌ویی مه‌زن كه‌ وا سیازده سه‌ده‌ی ره‌به‌قه‌ ده‌سته‌ڵاتداری و فه‌رمانڕه‌وایی‌یه‌كه‌ی به‌رده‌وامه‌ و، چه‌نده‌ها گیان و ژیری و دڵ و ده‌روونی له‌ژماره‌به‌ده‌ری پێگه‌یاند و په‌روه‌رده‌ و پاكژی كردن و به‌ حه‌ق و ڕاستی به‌رێوه‌ی بردن.. ئایا ته‌نها ئاماژه‌یه‌كی ئه‌و پادشا مه‌عنه‌وی‌یه‌ مه‌زنه‌ سه‌روزیاد نی‌یه‌ بۆ چه‌سپاندنی "حه‌شر"؟ چ جای ئه‌وه‌ی كه‌ هه‌زاران وته‌ی ڕاسته‌وخۆی ڕوون و چه‌سپێنه‌ری حه‌شری به‌ ڕاشكاوی تێدایه‌؟! ئایا ئه‌و كه‌سه‌ی له‌م ڕاستی‌یه‌ ڕوونه‌ تێ‌ناگات، مرۆڤێكی نه‌فام و نه‌زان نی‌یه‌؟ ئایا ئه‌وپه‌ڕی دادگه‌ری نی‌یه‌ كه‌ جێی ئه‌و كه‌سه‌ ناخی دۆزه‌خ بێت و له‌وێ‌دا بگیرسێته‌وه‌؟

پاشان هه‌موو كتێب و صوحوفه‌ ئاسمانی‌یه‌كانی تر كه‌ خوای گه‌وره‌ بۆ پێغه‌مبه‌رانی پێشووی ناردوون و هه‌ر یه‌كه‌یان ماوه‌یه‌ك فه‌رمانڕه‌وای كاتی خۆی بووه‌، به‌ هه‌زاران به‌ڵگه‌، ئه‌و ده‌عوایه‌ی قورئانی پیرۆزیان سه‌باره‌ت به‌ "حه‌شر" سه‌لماندووه‌، هه‌رچه‌نده‌ش به‌پێی داخوازیی چه‌رخ و سه‌رده‌مه‌كانیان و گه‌لێ به‌ كورتی باسی ڕاستی و بێ‌گومانیی حه‌شریان كردووه‌، كه‌ قورئانی پیرۆز به‌وپه‌ڕی ڕوونی لێی دواوه‌، ئه‌و قورئانه‌ی كه‌ فه‌رمانڕه‌وای هه‌موو سه‌رده‌مێكه‌ و به‌سه‌ر تێكڕای ئاینده‌شدا زاڵ و ده‌سته‌ڵاتداره‌.

وا لێره‌دا و له‌به‌ر شیاویی ئه‌م باسه‌، ده‌قی كۆتایی په‌یامی **"موناجات"** ده‌هێنین، كه‌ به‌ڵگه‌یه‌كی گومانبڕی پوخته‌ له‌سه‌ر حه‌شر و، له‌ شایه‌تی‌دان و به‌ڵگه‌بوونی پایه‌كانی تری ئیمانه‌وه‌ له‌سه‌ر "حه‌شر" په‌یدا بووه‌، به‌ تایبه‌ت له‌ "ئیمان به‌ پێغه‌مبه‌ران و كتێبه‌كانه‌وه‌" كه‌ هه‌رچی گومان و دوودڵی هه‌یه‌ ته‌فروتوونایان ده‌كات، بۆیه‌ ده‌یشی هێنین چونكه‌ به‌ شێوازێكی كورت و له‌ شێوه‌ی نزا و لاڵانه‌وه‌دا باس كراوه‌:

(ئه‌ی په‌روه‌ردگاری میهره‌بانم! به‌هۆی فێركاریی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و وانه‌كانی قورئانی پیرۆزی داناوه‌، تێ‌گه‌یشتم كه‌ هه‌موو كتێبه‌ پیرۆزه‌كان، له‌ پێشه‌كیی هه‌موویانه‌وه‌ قورئانی پیرۆز.. هه‌روه‌ها گشت پێغه‌مبه‌ران، له‌ پێش هه‌موویانه‌وه‌ پێغه‌مبه‌ری ئازیزمان ﷺ هه‌ر هه‌موویان به‌ڵگه‌ن و به‌ یه‌كده‌نگی و یه‌كێتی ئاماژه‌ ده‌كه‌ن و شایه‌تی ده‌ده‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌:

دره‌وشانه‌وه‌ی ناوه‌ جوان و شكۆمه‌نده‌كانی خوای گه‌وره‌ كه‌ له‌ دنیا و هه‌موو جیهانه‌كاندا شوێنه‌واریان دیار و ئاشكرایه‌، له‌ جیهانی هه‌میشه‌یی و هه‌تاهه‌تاییشدا به‌ جۆرێكی گه‌لێ ڕوونتر به‌رده‌وام ده‌بێت، هه‌روه‌ها دره‌وشانه‌وه‌ میهره‌بانه‌كانی ئه‌و ناوانه‌ كه‌ نموونه‌كانیان له‌م جیهانه‌ فانی‌یه‌دا ده‌بینرێن، له‌و دنیای خانه‌ی به‌خته‌وه‌ری‌دا جوانترین و دره‌وشاوه‌ترین ڕوونا كی به‌رهه‌م ده‌هێنن و به‌ هه‌میشه‌یی ده‌مێننه‌وه‌. هه‌روه‌ها ئه‌و

تاسەمەندانەش کـە لـەم ژیانـە کورتـەی دنیـادا بەوپـەڕی شـەوقەوە سـەرنج لـەو درەوشـانەوانە دەدەن و بۆیان دەڕوانن، لەودنیادا تا ئەبەد بە خۆشەویستی‌یەوە هاوڕێیـان دەبـن و بـە نـەمری لەگەڵیاندا دەمێننەوە.

هەروەها گشت پێغەمبەران - دروودیان لەسـەر بێـت - کـە دارای گیـانی ڕوونـاکن، لـە پێش هەموو شیانەوە پێغەمبـەری ئـازیز ﷺ و، هـەموو ئـەولیاکان کـە جەمسـەری خـاوەن دڵـە ڕۆشنەکانن و، گشـت صیددیقـانیش کـە سـەرچاوەی ژیری‌یـە بینـەر و ڕوونەکانن.. هـەموو ئەوانە ئیمانێکی قووڵی دامـەزراویان بـە "حەشر" هەیـە و، شـایەتیی لەسـەر دەدەن و، مژدەی بەختەوەریی هەمیشەیی بـە مرۆڤایـەتی ڕادەگەیـەنن و، گومڕایـان بـە مەترسیی ئـاگری دۆزەخ بێدار دەکەنـەوە و، مزگێنـی بـە ڕێڕەوانـی ڕێـی هیدایـەت دەدەن کـە بەهەشـت چـارەنووس و پاشەڕۆژ و ئەنجامیانە و، لەمەشدا پشت بە سـەدان موعجیزەی ڕوون و نیشـانەی بێ گومـان و ئەو بەڵێن و هەڕەشانەش دەبەستن کە چەندەها جـار لـە کتێـب و صوحوفـە ئاسمانی‌یەکانتدا - ئـەی پـەروەردگارم! - باسـت کـردوون. هـەروەها پشـت بـە: بـەزەیی شـکۆمەندی و، دەستەڵاتداریی پەروەردگاری و، کاروبارە بـەرز و، سیفەتە پـاك و پیرۆزەکـانی تـۆ دەبەستن، وەك: توانسـت و میـهرەبانی و عینایـەت و دانـایی و شـکۆمەندی و جوانـی و، بـە پێـی ئـەو کەشـف و بینینە لەژمارەبەدەرانەی خۆیان کە هـەواڵی نیشـانەکانی دواڕۆژن و، بـە گوێـرەی ئەو ئیمان و باوەڕەشیان کە تا پلەی "علـم اليقين" و "عين اليقين" چەسپاو و دامەزراوە.

دەسا ئەی خواوەندی بەتوانای دانا و، بەخشـندەی میـهرەبان و، دارای بـەڵێنی ڕاسـت و، خـاوەنی سـەربەرزی و مەزنی و شـکۆمەندی و، لەناوبەری خوانەناسـان! تـۆ زۆر خـاوێن و پـاك و پـیرۆز و بـەرزتریت لـەوەی کـە هـەموو شوێنکەوتووان و، گشـت بـەڵێن و، سـەرجەم سیفەتە مـەزن و، کاروبـارە خـاوێن و پیرۆزەکـانی خـۆت بـەدرۆ بخەیتـەوە و، پـەردە بەسـەر داخوازیی دەستەڵاتداریی خۆتدا بگێڕیت و، ئەو هەموو دوعا و نزایانە گیرا نەکـەیت کـە ئـەو بەندە باشانەت دەیانکەن کە خۆشت دەوێن و خۆشیان دەوێیت و لە ڕێـی ئیمـان و تەسـدیق و گوێڕایەڵی‌یەوە خۆیان لەلا خۆشەویست کردوویت، تۆ خاوێن و پیرۆز و بەرزی لەوەی کە کافر و گومڕایان لە ئینکاری کردنی حەشردا تەسدیق بکەیت، ئەوانەی کە بە بۆنەی کوفـر و سەرپێچی کردنیان و بـە درۆخسـتنەوەی تـۆ و بەڵێنەکانتـەوە دەسـتدرێژی بـۆ سـەر مـەزنیی تـۆ دەکەن و، گاڵتەیان بە بەرزیی شکۆمەندی و، مەزنیی خوایەتی و، میـهرەبانیی پـەروەردگاریی تۆ دێت.

ئەوەتا ئێمە تەقدیسـێکی بێ سـنوور و نـەبڕاوەی دادگـەری و جوانیـی ڕەهـا و میـهرەبانیی فراوانی تۆ دەکەین و، لەم ستەمە ناڕەوایەی بە دوور دەزانین و پاکی ڕادەگرین و.. بـە هـەموو هێز و توانایەکمانـەوە باوەڕمـان وایـە کـە هـەزاران پێغەمبـەری ئـازیز و، چـەندین پیاوچـاك و

ئەولیای لەژمارەبەدەر کـە بـانگی مرۆڤایـەتی بۆ لای تۆ دەکـەن، هـەموو ئەوانـە بـە: "حـق الیقین" و "عین الیقین" و "علـم الیقین" گەنجینەکانی میهرەبانیی دوارۆژ و چاکەکاریەکانی تۆ لـە جیـهانی هەمیشـەییدا و، درەوشـانەوەی نـاوە جوانـەکانت کـە بـە تـەواوی لـە خانـەی بەختەوەریدا دەردەکەون، دەبینن و چاویان لێیەتی.

هـەروەها باوەڕمـان هەیـە کـە ئـەم شـایەتیدانەی ئـەوان حـەق و ڕاسـتە و ئامـاژە کـردن و مژدەدانەکانیشیان هـەموو ڕاستن و دێنـەدی، چونکـە ئـەوان هـەموویان باوەڕیـان وایـە ئـەم ڕاستییە مەزنەی "حەشر" تیشـکێکی مـەزنی نـاوی پیرۆزی "الحق"ی تۆیـە، کـە سـەرچاوە و خۆری ڕووناکی هەموو ڕاستییەکانە. کەواتـە ئـەوان بـە ئیزنی خۆت و لـە بازنـەی حـەق و ڕاستیدا ڕێنمایی بەندەکانت دەکەن و هەمان حەقیقەت و ڕاستییان تێدەگەیەنن.

دەسا ئەی پەروەردگارم! بە خاتری دەرس دادانی ئەوان و لەبـەر ڕێـزی ڕێنماییـەکانیان، ئیمانی تەواوەتی و ئەنجامی خێر و باش بە ئێمە و قوتابییـانی نـوور ببەخشـە و، وامـان لـێ بکـە شایانی شەفاعەتی ئەوان بین، ئامین).

بەم جۆرە بۆمان دەرکـەوت کـە هـەموو ئـەو بەڵگـانـەی ڕاستیی قورئـان تەنانـەت ڕاستیی هەموو کتێبە ئاسمانییەکان دەسەلمێنن و.. هەموو ئەو موعجیـزە و بەڵگانـەش کـە پێغەمبـەرێتیی خۆشەویستی خوا ﷺ بگرە هی گشت پێغەمبەرانی تریش دەچەسپێنن.. هـەموو ئـەو بەڵگانـە، لە هەمان کاتدا، گرنگترین شتێکیش دەچەسپێنن کە ئەو کتێب و پێغەمبەرانـە خـەڵکیان بـۆ لا بانگ دەکەن و گرنگترین لایەنی بانگەوازەکەیانە کە: (هاتنەدیی قیامەت)ە.

هەروەك ئەوانە ئەمـەیان چەسپاند.. بـە هـەمان جـۆر زۆربـەی ئـەو بەڵگانـەش کـە شایەتی "بوون" و "یەکتایی" خواوەندی "واجب الوجود"ن، شایەتیشن لەسەر خانەی بەختـەوەری و جیهانی مانـەوە و هەمیشـەیی، کـە جەمسـەر و دەرخـەری پـەروەردگاری و خوایـەتیی خـوای گەورەن.. ئەو بەڵگانە – وەك لەو مەقامانـەی کـە لەمـەولا دێـن، ڕوون دەکرێنـەوە – شـایەتن لەسەر هاتنەدیی ئەودنیا و کردنەوەی دەرگاکانی. چونکە "بوون"ی خـوای گـەورە و سیفەتە مەزن و زۆربـەی نـاوە جوانـەکانی و کاروبـارە پڕ لـە دانـایی و وەسـفە خـاوێن و پیرۆزەکـانی وەك: پـەروەردگاری و، خوایـەتی و، میـهرەبانی و، چـاودێری و، دانـایی و، دادگـەری، هەموویان بـە ئـەندازەی پلـەی پێویستی و بـۆ مەبەستی پاداشـت و تۆڵەسـەندنەوە، داخـوازی بوونی "قیامەت" دەبن.

بەڵـێ، مادەم خوای گەورە هەیە و تاك و تەنیایە و ئەزەلی و ئەبەدییە، ئەوا دەبێ ئەو شتەش کە خولگەی دەسەڵاتداریی خوایەتییەکەیەتی، کە دوارۆژە، ئەویش ببێت.. هەروەها مـادەم پـەروەردگاریێتیی ڕەهـای خـوای گـەورە لـەم بوونـەوەرەدا، بـە تایبـەت لـە زیندەوەرانـدا،

دەردەکەوێت و پەروەردگاری‌یەکی شکۆمەند و مەزن و دانا و میهرەبانی ڕوون و ئاشکرایە، ئەوا دەبێ خانە و لانەیەك بۆ بەختەوەریی هەمیشەیی بێتە پێشەوە کە دەست بە ڕووی ئەو گومانانەوە بنێت کە پەروەردگاریتیی ڕەهای خواوەند بەوە لەکەدار دەکەن گوایا بەدیهێنراوانی خۆی بێ هیچ پاداشتێك بەرەڵا دەکات و لێیان ناپرسێتەوە. هەروەها دانایی خواوەند لە: بێ‌مەبەستی و، میهرەبانی‌یەکەشی لە تۆمەتی: غەدرکاری بپارێزێت. واتە ئەو خانەی بەختەوەری‌یە بێ هیچ گومانێك هەیە و دەبێ مرۆڤی تێ‌بچێت.

هەروەها مادەم ئەم هەموو جۆرە نیعمەت و بەخشایش و چاکە و ڕێز و چاودێری و میهرەبانی‌یانە، ئاشکران و، لە بەرچاوی عەقڵاندا - گەر تروسکایی‌یان لێ نەبڕابێت - و لە بەردەم دڵانیشدا - گەر نەمردبێتن - بە چاو دەبینرێن و، دەبن بە بەڵگە بە دەستمانەوە لەسەر بوونی پەروەردگارێکی میهرەبان لە پشت پەردەی ڕواڵەتی گەردوونەوە، ئەوا دەبێ ژیانێکی نەمری بەردەوام بێتەکایەوە تاکو ئەو نیعمەت بەخشینەی باسمان کرد لە گاڵتەجاڕی ڕزگار بکات و، مەودای ڕاستەقینەی خۆی وەربگرێت و.. چاکەکاری‌یەکانیش لە تۆمەتی هەڵخەڵەتاندن بپارێزرێن تاکو حەقیقەتەکەیان دەربکەوێت و.. چاودێری‌یەکانیش لە چنگی بێ‌مەبەستی دەرباز بکات، تاکو بە تەواوی بێنەدی و.. میهرەبانیش لە دەستی ڕق و قین ڕزگار بکات تا هەموو ڕووەکانی دەربکەون و.. لوتف و کەرەمی خواوەندیش لەوە دەرباز بکات کە بە ئیهانەکردن دابنرێن، تاکو ڕووەو بەندەکانی خوا بکەونەکار و بەسەریاندا بڕێژرێن. بەڵێ، ئەو شتەی نیعمەت و چاکەی کردووە بە نیعمەت و چاکەی ڕاستەقینە، بریتی‌یە لە بوونی ژیانێکی بەردەوامی هەمیشەیی لە جیهانی مانەوە و نەمری‌دا.. بەڵێ، دەبێ ئەمە بێتەدی.

هەروەها مادەم قەڵەمی توانستی خوای گەورە لە وەرزی بەهار و لەسەر تەنها یەك لاپەڕەی تەسکی بچووکدا سەد هەزار کتێب بە چەشنێکی تێهەڵکێش دەنووسێت، بێ هیچ چەشنە هەڵە و ناتەواوی و ماندووبوونێك، وەك لە بەرچاودا ڕوون و ئاشکرایە.. هەر خاوەنی ئەو قەڵەمە، سەد هەزار جار بەڵێنی داوە کە: "کتێبێکی ئاسانتر لەو کتێبە نووسراوەی بەهاری بەرچاوتان بە چەشنێکی هەمیشەیی و بەردەوام دەنووسم، لە شوێنێکی گەلێ فراوانتر و جوانتریش لە چاو ئەم شوێنە تەسك و تێکەڵ و پێکەڵەی بەهار.. ئەو کتێبەی کە دەینووسم هەرگیز لەناوناچێت و بە جۆرێك دەبێت کە بتوانن بە سەرسووڕمان و سەرسامی‌یەوە بیخوێننەوە"!

مادەم خواوەند لە هەموو فەرمانەکانی‌دا باسی ئەو کتێبە دەکات، ئەوا دەبێ - بێ هیچ گومانێك - سەرەتا و بناغەکانی ئەو کتێبە هەر ئێستا نووسرابن و، پەراوێزەکانیشی لەمەولا

بە حەشر و نشوور و زیندووبوونـەوە پڕ بكرێنـەوە و لاپـەڕەی كردەوەكـانی هەموانیشـی تێدا بنووسرێنەوە..

هـەروەها مـادەم ئـەم زەوی‌یـە، لـەو ڕووەوە كـە زۆربـەی بەدیــهێنراوان و سـەدان هـەزار جـۆری زینـدەوەر و گیانلەبەرانی جۆراوجۆر و گـۆڕاوی تێدایـە، بـووە بـە: ناوجەرگـە و مەڵبەند و كورتە و پوختە و هۆی بەدیهێنانی گەردوون و، هەمیشە هاودەمە لەگـەڵ ناوهێنـانی ئاسـمانەكاندا وەك ئەوەی كـە لە فەرمانە ئاسـمانی‌یەكانی هاوچەشـنی: "ربُّ السَّـمواتِ والأرضِ"دا ناوی هێنراوە..

هەروەها مادەم ئادەمیزاد لە هەموو لایەن و ڕووەكانی ئـەم سـەرزەوی‌یەی كـە ئـەم هـەموو چییـەتی و تایبەتكاری‌یانـەی هەیـە، فەرمانڕەوایـە و، خـاوەنی هەڵسـوكەوتی سـەربەخۆیە لـە زۆربــەی بەدیـهێنراوانی نـاو زەوی‌دا و، زۆربـەی زیندەوەرانیــش بـۆ خــۆی ڕام و ژێربـار دەكات و زۆربەی بەدیهێنراوانی ناویشی وا لـێ دەكات كە بەپێی پێوەر و ئارەزووەكانی و بە گوێـرەی پێداویسـتی‌یە سروشـتی‌یەكانی مـرۆڤ هەڵسـوكەوت بكـەن و بــە دەوری‌دا هەڵبسووڕێن و مرۆڤ ڕێكیـان بخـات و ئارایشتیان بـدات و بیانخاتـە پێش‌چـاوان و، جـۆرە سەرسووڕهێنەرەكانی بەدیـهاتووانی سـەر ڕووی زەویـش وەهـا ڕێك بخـات كـە نـەك تەنـها سـەرنجی جینـی و مـرۆڤ، بـەڵكو سـەرنجی هـەموو دانیشـتووانی ئاسمانـەكان و تێكـڕای گـەردوون و تەنـانەت خاوەنی گەردوونیش ڕابكێشـێـت و، لـەم ڕێیـەوە - ئـەم ئادەمیزادە - ڕێز و تەقدیری شایانی خۆی لەوانەوە دەست كەوت و لەم ڕووەشـەوە گرنگی‌یـەكی مـەزن و نرخێكی بـاڵای پـەیدا كرد و، مرۆڤ لـە ئەنجامی ئەمـەوە و بـەو زانسـت و كارامەیی‌یـەی كـە هەیەتی، دەری‌خست: مەبەست لە بەدیـهێنانی بوونـەوەراندا تەنـها ئـەوە و، هـەر ئـەو ئـەنجامی مەزن و بەری بەنرخی درەختی بوونەوەرانە. ئەمەشت بەلاوە سەیر نەبێت! چونكە تەنها مرۆڤە كـە بەرپرسی ئاوەدانكردنەوەی زەوی‌یـە. جـا لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ سـنعەتە بـێ وێنـەكانی بەدیهێنەر بە چەشنێكی جوانی سەرنج ڕاكێش لەم دنیایەدا ڕێك دەخات و دەیانخاتە ڕوو، ئەوا سزای سەرپێچی و كافری‌یەكەی خراوەتە ئەودنیا و، مۆڵەت دراوە لەم دنیادا بـژی تـاكو ئـەم ئەركەی سەرشانی بە چەشنێكی سەركەوتووانە ڕابپەڕێنێت.

هەروەها مادەم ئەم ئادەمیزادەی كە ئەم چییەتی و تایبەتكاری‌یانەی لە سروشـتدا دروسـت كراوە و، لەگەڵ لاوازی‌یە هـەرە بـەتین و توندەكەشی‌دا چـەندین پێداویستیی بێ‌سنوور و.. لەگەڵ كۆڵەواریی هەرە تەواویشی‌دا چەندین ئازاری لەژمارەبەدەری هەیە.. مادەم ئەم مرۆڤە پەروەردگارێكی ئەوەندە بەتوانای هەیە كە خـاوەنی توانسـت و میهرەبانی‌یـەكی ڕەهـای وایـە ئـەم زەوی‌یـە زەبـەلاح و یـەكجار مەزنـە بكـات بـە: گەنجینـەیـەكی گـەورەی جۆرەهـای ئـەو

کانزایانـەی کـە مـرۆڤ پێویستی پێیـان دەبێـت و، کۆگـای ئازووقـەی هـەموو جـۆرە خواردەمەنی‌یـە پێویستەکان و، بـازاڕ و دوکـانی ئـەو سـەروەت و سـامانە جۆراوجۆرانـەی حـەزی لێیانـە .. مـادەم ئـەم خـواوەندە بـە چـاوی عینایـەت و میهـرەبانی‌یەوە بـۆ مـرۆڤ دەڕوانێت و پەروەردەی دەکات و داخوازی‌یەکانی بۆ دەهێنێتەدی..

هـەروەها مـادەم پـەروەردگاری مـەزن – وەك لـەم ڕاستی‌یەوە دەردەکـەوێت – مرۆڤـی خۆش‌دەوێت و خۆی لە لا خۆشەویست دەکات و، خۆیشی هەمیشەیی‌یە و چـەندین جیـهانی بەردەوام و هەتاهەتاییشی هەیە و، کاروبارەکانی بەپێی دادگەری و بە گوێرەی دانـایی خـۆی ئەنجام دەدات و، مەزنیی دەستەڵاتداری و هەمیشەیی فەرمانڕەوایی ئەم بەدیهێنەرە ئەزەلی‌یە لەم دنیا تەسکەدا و لە تەمەنی هەرە کورتی مرۆڤ و تەمـەنی ئـەم زەوی‌یـە فـانی و کاتی‌یـەدا جێـی نابێتـەوە، چونکـە ئـەو ستەم و تاوانانـەی مـرۆڤ دەیانکـات و ئـەو ئینکـاری و بـێ گوێیی و کوفرانەی بەرامبەر بە خواوەندی خۆی دەیان‌نوێنێت (ئەو خواوەندەی کـە نیعمـەتی بەسـەردا باراندووە و بە میهرەبانی و شەفەقەتێکی تەواو پێی گەیاندووە) هەموو تاوانـەکانی ئـەم مرۆڤـە، لـەم دنیایـەدا بێ تۆڵـە دەمێننـەوە، دیـارە ئەمـەش دژ و پێچەوانـەی ئـەو ڕێسـا ڕێکـەی نـاو گەردوونـە و پێچەوانـەی دادگـەری و هاوسـەنگیی بێ گـەرد و تـەواوی ناویـەتی. چونکـە ستەمکاری بێ‌ویژدان و بێ‌بەزەیی، ژیـانی بەخۆشـی دەباتەسـەر، بـەڵام بابـای ستەم لێکـراوی بەدبەخت، ژیانی بە کولەمەرگی لـێ دەگوزەرێت..

بێ هیچ گومانێك ڕاستی و ماهییەتی ئـەو دادگەری‌یـە ڕەهایـەی ئـەو، کـە شـوێنەواری لـە بوونەوەراندا دەبینرێت، هەرگیزاوهەرگیز ڕازی نابێت بەوەی: ستەمکار و ستەم لێکـراو کـە لە مردندا یەکسانن، زیندوو نەکرێنەوە و لـێپرسینەوەیان نەیەتە ڕێ..

هەروەهـا مـادەم خـوای گەورەی خـاوەنی موڵکـی دنیـا و قیامـەت، لـەناو گـەردووندا زەوی و، لەناو زەویشدا مرۆڤی هەڵبژاردووە و، پایە و ڕێزێکی بـەرز و بایـەخ و گرنگی‌یـەکی باڵای داوەتێ و، لە نێوان مرۆڤیشدا پێغەمبەران و ئەولیا و پیاوچاکانی هەڵبژاردووە، ئەوانەی کە لەگـەڵ مەبەستەکانی پـەروەردگاردا گونجـاون و، بـە ئیمـان و گوێڕایـەڵی خۆیـان لـە لا خۆشەویست کردووە و، خوای گەورەش ئـەوانی کـردووە بـە ئـەولیا و خۆشەویسـت و قسـە لەگەڵ کراوانی خۆی و، بە موعجیزات و یارمەتی لە کاروبارياندا ڕێزی لـێ ناون و بـە زڵلـە ئاسمانی‌یـەکانیش دوژمنـانی ئـەوانی تـەمێ کـردووە و، لـە نێـوان ئـەو خۆشەویستانەشـدا ئـەو کەسـەی هەڵبژاردووە کە پێشـەوا و مایەی شانازی و سەربەرزی‌یانە کە حـەزرەتی محەممـەدە ﷺ و نیوەی بە کەڵکی گۆی زەوی و، پێنجیەکی بە بایەخی گرۆی مرۆڤی لە ماوەی چـەندین سەدەی دوور و درێژدا بە نووری ئەو ڕووناك کردووەتەوە، بە چەشنێ کە دەڵێـی بوونـەوەران

له‌به‌ر ڕێزنان له‌و به‌دی‌هێنراون، چونكه‌ به‌هۆی ئه‌و خۆشه‌ویستەوه‌ و به‌ بۆنه‌ی ئه‌و ئایینه‌ی كه‌ هێنای و ئه‌و قورئانه‌ی بۆی نازڵ كرا، ئامانج و مه‌به‌ستی به‌دیهێنان ده‌ركه‌وت و ئاشكرا بوو.

جا هه‌رچه‌نده‌ ئه‌م پێغه‌مبه‌ره‌ ﷺ شایانی ئه‌وه‌یه‌ كه‌ به‌رامبه‌ر خزمه‌تگوزاری‌یه‌ مه‌زن و له‌ ژماره‌ و سنووربه‌ده‌ره‌كانی به‌ ته‌مه‌نێكی درێژخایه‌ن و شایانی خۆی پاداشت بدرێته‌وه‌، كه‌چی ته‌مه‌نێكی كه‌می شه‌ست و سێ ساڵیی پڕ ئه‌شكه‌نجه‌ و ئازاری پێ برا!

جا ئایا هه‌رگیز ده‌گونجێ و ده‌چێته‌ عه‌قڵه‌وه‌ یان هیچ گریمانێك له‌وه‌دا هه‌یه‌ كه‌ ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ و هاوڕێنه‌ و خۆشه‌ویستانی ئه‌و زیندوو نه‌كرێنه‌وه‌ و ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ هه‌ر ئێستا به‌ ڕۆح زیندوو نه‌بێت و، هه‌ر به‌ ته‌واوی تیابچێت و به‌ نه‌مان كۆتایی پێ بێت؟ نه‌خێر.. هه‌زار جار نه‌خێر..

به‌ڵێ، گه‌ردوون و هه‌موو ڕاستی‌یه‌كانی جیهان، زیندووبوونه‌وه‌ و ژیانی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ ئازیزه‌ ﷺ له‌ خاوه‌نی گه‌ردوون داوا ده‌كه‌ن..

په‌یامی "الآیة الكـــبری" كه‌ تیشكی حه‌وته‌مه‌، به‌ سی و سێ یه‌كده‌نگیی مه‌زن، كه‌ هه‌ریه‌كه‌یان به‌ چه‌شنی سه‌ختیی چیای به‌رز و مه‌زن به‌ڵگه‌كانیان به‌هێز و چه‌سپاوه‌، چه‌سپاندوویه‌تی كه‌ ئه‌م گه‌ردوونه‌ ته‌نها له‌ ده‌ستی یه‌ك كه‌سه‌وه‌ ده‌رچووه‌ و دروست كراوه‌ و، ته‌نها موڵكی خوایه‌كی تاك و ته‌نیایه‌. ئه‌و په‌یامه‌ به‌و به‌ڵگانه‌ی خۆی "ته‌وحید"ی ده‌رخست و به‌ ئاشكرا ئه‌وه‌ی گه‌یاند كه‌ "ته‌وحید" جه‌مسه‌ری كه‌ماڵی خواوه‌نده‌ و، ڕوونی كردەوه‌ كه‌ به‌هۆی "تاك و ته‌نیایی"یه‌وه‌ هه‌موو گه‌ردوون وه‌ك چه‌ند سه‌ربازێكی ئاماده‌ و له‌سه‌رپێ و فه‌رمانبه‌رداری گوێڕایه‌ڵیان لێ دێت بۆ ئه‌و خواوه‌نده‌ تاك و ته‌نیایه‌. ئه‌و په‌یامه‌ ئه‌وه‌شی ڕوون كردووه‌ته‌وه‌ كه‌ به‌ هاتنی قیامه‌ت كه‌ماڵاتی خواوه‌ند دێنه‌دی و، دادگه‌ریی ڕاسته‌قینه‌ی ئه‌و زاڵ ده‌بێت و له‌ تۆمه‌تی سته‌م ڕزگاری ده‌بێت و، دانسته‌ گشتی‌یه‌كه‌شی له‌ گاڵته‌جاڕی و بێ‌مه‌به‌ستی و هه‌رزه‌یی ده‌پارێزێت و، میهره‌بانی‌یه‌ فراوانه‌كه‌شی مه‌ودای خۆی وه‌رده‌گرێت و له‌ ناو و ناتۆره‌ی "ئازاردان" ده‌رباز ده‌بێت و، به‌رزی و توانسته‌ ڕه‌هاكانیشی ده‌رده‌كه‌ون و له‌ چنگی كۆڵه‌واری قوتار ده‌كرێن و، هه‌موو یه‌كێ له‌ سیفه‌ته‌ بێ‌گه‌رده‌كانی به‌ خاوێنی و مه‌زنی ده‌رده‌كه‌ون و ئاشكرا ده‌بن.

كه‌واته‌.. هه‌رگیزاوهه‌رگیز هیچ گومانێك له‌وه‌دا نی‌یه‌ كه‌ قیامه‌ت به‌رپا ده‌بێت و، حه‌شر و نشوور دێته‌كایه‌وه‌ و، ده‌رگاكانی خانه‌ی تۆڵه‌ و پاداشت ده‌كرێنه‌وه‌. ئه‌مه‌ش به‌پێی داخوازیی ئه‌م هه‌شت بڕگانه‌ی پێشوو كه‌ به‌: "مادەم" ده‌ستیان پێ كرد و، كه‌ هه‌ریه‌كه‌یان مه‌سه‌له‌یه‌كی ناسك و سه‌رنجێكی پڕ له‌ واتای وردن و له‌ نێوان سه‌دان سه‌رنجی وردی "ئیمان به‌ خوا"دا هێنراون.

بۆ ئەوەش قیامەت بەرپا دەبێت، تاکو: گرنگی و جەمسەربوونی زەوی و، پایە و ڕێزی مرۆڤ بێنەدی و، دادگەری و میهرەبانی و دەسەڵاتی بەدیهێنەر و پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی دەربکەون و، ئەولیا و خۆشەویستە ڕاستەقینە و تاسەمەندەکانی خواوەندی پەروەردگاری هەمیشەیی لە نەمان و تیاچوونی هەمیشەیی ڕزگاریان بێت و، مرۆڤە مەزن و خۆشەویست و هەرە بەڕێزەکەیشیان پاداشتی کردەوەکانی و ئەنجامی ئەو خزمەتگوزارییە مەزنانەی خۆی ببینێت کە بوونەوەرانی منەتبار و ڕەزامەند کردووە و.. بۆ ئەوەش کە کەماڵ و تەواویی پادشای هەمیشەیی لە قسوور و ناتەواوی و، توانستەکەی لە کۆڵەواری و، داناییەکەیشی لە نەفامی و، دادگەرییەکەشی لە ستەم بپارێزن و بە پاکی و بێ گەردی و خاوێنی ڕاگیر بکرێن.

**بە پوختی:**

مادەم خوا هەیە، ئەوا دواڕۆژ و قیامەت هیچ جۆرە گومانێکی تێدا نییە!

* * *

ئنجا هەروەك ئەم سێ پایە ئیمانییانەی پێشوو، بە هەموو بەڵگەکانیانەوە **"حەشر"** دەچەسپێنن و شایەتیی لەسەر دەدەن.. بە هەمان جۆر دوو پایەکانی تری ئیمانیش کە "ئیمان بە مەلائیکەت و قەدەر"ن، حەشر دەچەسپێنن و دەبن بە بەڵگە و شایەتییەکی بەهێز لەسەر هاتنی جیهانی هەمیشەیی، ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

هەموو ئەو بەڵگە و بینین و گفتوگۆیانەی کە بەڵگەن لەسەر بوون و کار و فرمانی مەلائیکەتەکان، بەڵگەیشن لەسەر جیهانەکانی: ڕۆح و غەیب و جیهانی هەمیشەیی و قیامەت و خانەی بەختەوەری و بەهەشت و دۆزەخ کە بە جیننی و ئادەمیزاد ئاوەدان دەکرێنەوە. چونکە "مەلائیکەت" بە ئیزن و فەرمانی خوای گەورە دەتوانن بڕۆنە ناو ئەو جیهانانە و بیانبینن. خۆ مەلائیکەتە نزیکەکانی دیوانی خواوەندیش - وەك حەزرەتی جوبریل، دروودی لەسەر بێت، کە لەگەڵ مرۆڤدا موقابەلە و گفتوگۆی کردووە - بە یەك دەنگ هەواڵی: بوونی ئەو جیهانە ناوبراوانە و هاتوچۆیان تیایاندا، ڕادەگەیەنن. هەروەك لە قسەی ئەوانەی کە لە ئەمریکاوە هاتوونەتەوە، دەزانین کیشوەری ئەمریکا هەیە، هەرچەندەش خۆمان نەماندیوە.. بە هەمان جۆر ئەو شتانەش بێ گومان و جێی باوەڕن و لە هێزی تەواتوردان، کە مەلائیکەتان ڕایاندەگەیەنن و، کە چەند هەواڵێکی سەبارەت بە جیهانی هەمیشەیی و دواڕۆژ و بەهەشت و دۆزەخن، ئێمە بەو جۆرە، باوەڕ بەو هەواڵانە دەکەین و دەیانسەلمێنین.

* * *

هەروەها ئەو بەڵگانەش کە **"ئیمان بە قـــەدەر"** دەچەسپێنن، وەك لـە پـەیامی قـەدەر (وتـەی بیسـت و شەشـەم)دا بـاس كـراون، لـە هـەمان كاتدا بەڵگەشـن لەسـەر حەشـر و خستنەڕووی لاپەڕەی كردەوەكان و كێشانەیان لە بەردەم تەرازووی هـەرە مـەزندا. چونكـە تۆمـار كردنـی چارەنووسی هەموو شتێك لـەسـەر لـەوحـەكانی ڕێسـا و تـەرازوو و، نووسـینی ڕووداوەكـانی ژیـانی هـەموو زیندەوەرێـك لـە هێزە پارێزەرەكـانی و لــەناو تـۆو و نـاوك و گشـت لـەوحـە میسالی‌یەكانی‌دا و تەرخان كردنی دەفتەری تۆمار كردنی كردەوە بۆ هەموو گیانلەبەرێك، بـە تایبەت مرۆڤ و، جێگیر كردن و تۆمار كردنی ئەو كردەوانە لە چەندین لەوحی پارێزراودا..

هـەموو ئـەم ئەندازەیـەی "قـەدەر" كـە بــە چـاو دەیـانبینین و هـەموو شـتێك دەگرنـەوە و تـەقدیرێكی پڕ لــە دانـایی و تۆمـار كردنێكـی یـەكجار ورد و نووسـینێكی پارێزكـاری بـە ئەمانەتن.. هەموو ئەمانە، تەنها لەبەر دادگایەكی مـەزن و بۆ تۆڵـە و پاداشـتی هەمیشـەیی ڕوو دەدەن. دەنا هیچ كەڵك و سوودێك لەو تۆماركردنە گشـتی و نووسـینەی كـە وردتریـن شـت دەنووسێت و دەیپارێزێت، وەرناگیرێت. چونكە ئەگـەر وا نـەبێ ئـەوا كـارێكی دژی حـەق و ڕاستی ڕوو دەدات. واتـە ئەگـەر حەشـر نەیەتـەدی، ئـەوا هـەرچی واتـای ڕاسـتیی كتێبـی گەردوون هەن، كە بـە قەڵـەمی قـەدەر نووسـراون، هـەموویان دەكوژێنـەوە و نـامێنن! ئـەوەش هەرگیز ناگونجێ و هیچ گریمانێك بۆ ڕوودانی نی‌یە و تابلێی كارێكی مەحاڵە و وەك ئینكاری كردنی ئەم بوونەوەرانە وایە، تەنانەت لـە وڕێنە زیاتر هیچی تر نی‌یە.

لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە:

هەموو بەڵگەكانی پێنج پایەكانی تری ئیمان، لە هەمان كـاتدا بەڵگەشـن لـەسـەر هاتنـەدیی حەشر و نشـوور و بوونـی دواڕۆژ و كردنــەوەی دەرگاكـانی، تەنانـەت داخـوازی دەبـن و شـایەتیی لـەسـەر دەدەن. لـەبـەر ئـەوە كـارێكی تـابلێی گونجاوە و گەلـێ جێـی خۆیـەتی كـە سێ‌یەكی قورئانی پیرۆزی خـاوەن ئیعجازی ڕەوان، لـە بـارەی حەشرەوە دەدوێـت، چونكـە حەشر دارای بەڵگـە و بناغەگەلـێكی وایـە كـە هـەرگیز جێ‌لـەق نـابن و، قورئـان ئـەم پایـە ئیمانی‌یە دەكات بە پشتگیر و بناغەی هەموو ڕاستی‌یەكانی تری و، ئەو ڕاستی‌یانە لەسـەر ئـەو بەردە بناغەیی‌یانە ڕاگیر دەكات.

(پێشەكی‌یەكە تەواو بوو)

## پارچەی دووهەمی

### پاشكۆی وتەی دەهەم

**ئەم پارچەیە مەقامی یەکەمە لە نۆ مەقامی چینەکانی ئەو نۆ دانـە بەڵگانـەی کە لـە بارەی حەشـرەوە دەدوێـن و، بـە چەشـنێکی ئیعجازبـەخش ئـەم ئایەتـە پیرۆزەی خوارەوە ئاماژەی بۆ کردوون:**

**﴿فسُبحانَ الله حين تُمْسُونَ وحينَ تُصْبِحُون ۞ وله الْحَمْدُ في السَّموات والأَرضِ وعشـيّاً وحينَ تُظْهِرُون ۞ يُخْرِجُ الحيَّ مِن الميّتِ ويُخرجُ الميّتَ من الحيّ ويُحي الأَرض بعـدَ مَوْتِـها وكذلك تُخْرَجون﴾** (الروم:١٧-١٩).

پشت بەخوا لێرەدا ئەو بەڵگـە ڕۆشـن و بـەهێزەی حەشـر ڕوون دەکرێتـەوە کـە ئـەم ئایەتـە پیرۆزانە دەریان خستووە[١].

لە بیست و هەشتەمین تایبەتکاریی "ژیان"دا وتراوە کە: "ژیان" هەر شەش پایەکانی ئیمـان دەچەسپێنێت و ڕووی لێیانە و ئاماژە بۆ هاتنەدییان دەکات.

بەڵێ، مادەم حیکمەت و کاکڵە و ناوەڕۆك و گرنگـترین ئـەنجامی بەدیـهێنانی بوونـەوەران بریتی بێت لە "ژیان" (واتە: "ژیان" خاوەنی ڕاستییەکی ئاوا بەرز و بڵند بێـت) ئـەوا هـەرگیز جێی ئەو ڕاستییە بەرزە لەم ژیانە فانی و کورت و ئازاربـەخش و ناتـەواوەی دنیـادا نابێتـەوە. بەڵکو مەزنیی ماهییەتی "ژیان" و.. هەر بیست و نۆ تایبەتکاریـیەکـەی و.. ئـەو ئەندازەیـەش کـە مـرۆڤ لـە ئامـانج و ئـەنجامی درەختـی "ژیـان" پـەیی پـێ دەبـات و.. بەروبوومــە مــەزن و شایانەکەی ئەو درەختـە، تەنـها "ژیـانی هەمیشـەیی دوارۆژە" کـە ژیانێکـە یەکپارچـە بـە دار و

---

(١) هێشتا ئەم مەقامە نەنووسراوە. بەڵام لەبەر ئەوەی مەسەلەی "ژیان" پەیوەندیی بە حەشـرەوە هەیـە، ئـەوا لێرەشـدا باس کرا. لە کۆتاییەکەیشیدا ئاماژە بۆ پایەی ئیمانیی: "باوەڕ بـە قـەدەر" کـراوە کـە مەسـەلەیەکی یـەکجار ورد و قووڵە. (دانەر)

به‌رد و خاك و خۆڵیه‌وه ـ له‌ خانه‌ی به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشه‌یی‌دا - زیندووه‌ و دارای ژیانه‌. ده‌نا گه‌ر وا نه‌بێت، ده‌بێ دره‌ختی "ژیان"، كه‌ له‌ خاوه‌ن هه‌ست و نه‌سته‌كان به‌ تایبه‌تی له‌ مرۆڤـدا ئه‌م هه‌موو ئامێره‌ زۆر و جۆراوجۆرانه‌ی پێ به‌خشراوه‌ و تیای‌دا دانراوه‌، زڕ و بێ به‌ر و بێ سوود بێت و دارای هیچ ڕاستی‌یه‌ك نه‌بێت.. مرۆڤیش ـ له‌ چاو به‌خته‌وه‌ریی ژیاندا ـ به‌ ڕسوایی و به‌دبه‌ختی بـژی و، لـه‌ تـام و چێـژی ژیـاندا بیسـت پلـه‌ لـه‌ خـوارووی پلـه‌ی چۆله‌كـه‌كانه‌وه‌ بێـت، لـه‌ كـاتێكدا كـه‌ مـرۆڤ بـالآترین بـه‌دیهێنراوه‌ و، به‌ڕێزتـرینی زینده‌وه‌رانه‌ و، له‌ سه‌رووی چۆله‌كه‌شه‌وه‌ به‌ بیست پله‌ پایه‌ی بۆ دیاری كراوه‌.

ته‌نانه‌ت ئه‌و "ژیری"یه‌ش كه‌ به‌نرخترین نیعمه‌ته‌ بۆ ئه‌م مرۆڤه‌، هه‌ر كه‌ بیر لـه‌ "په‌ژاره‌كانی دێرین" و "مه‌ترسی‌یه‌كانی دواڕۆژی ژیان"ی ده‌كاته‌وه‌، له‌ نیعمـه‌ت ده‌رده‌چێـت و ده‌بێـت بـه‌ مایـه‌ی بـه‌لآ و په‌رۆشـی و گـیروگرفت و، هـه‌رده‌م ئـازاری به‌سـۆ ده‌رخـواردی نـاخی دڵـی ده‌دات و، تامی ساف و بێ‌گه‌ردی "یه‌ك دانه‌" له‌زه‌تی ئه‌م دنیایه‌ی به‌ "نۆ دانه‌" ئازار بـۆ لێـڵ و ته‌ماوی ده‌كات!

ئه‌مه‌یه‌ به‌روبوومی "ژیان" گه‌ر ته‌نها پابه‌ندی ئـه‌م دنیایـه‌ بێـت! خـۆ دیـاره‌ ئـه‌نجامی ئـاوا لـه‌ سه‌دا سه‌د مه‌حاڵه‌ بۆ ئه‌و "ژیان"ه‌ی كه‌ دارای ئه‌و تایبه‌تكاری‌یه‌ ناوبراوانه‌ بێت!

كه‌واتـه‌ هـه‌ر ئـه‌م "ژیـان"ه‌ی دنیـا، بـه‌وه‌ی كـه‌ هـه‌رچی به‌هاره‌ سێ‌سه‌د هـه‌زار نموونـه‌ی حه‌شرمان بۆ ده‌رده‌خات، به‌ چه‌شنێكی گومـانبڕ پایـه‌ی ئیمـانیی: "بـاوه‌ڕ بـه‌ دواڕۆژ"مـان بـۆ ده‌چه‌سپێنێت.

ئایا ده‌گونجێ په‌روه‌ردگارێكی به‌توانای وا كـه‌: هـه‌رچی پێداویستی و داخوازیـی ژیـانت هـه‌ن و، سـه‌رجه‌می ئـه‌و ئامێرانـه‌ی چ لـه‌ جه‌سـته‌ی خـۆت و چ لـه‌ باخچه‌كـه‌ت و چ لـه‌ شاره‌كه‌تدا بۆ ژیانت پێویست ده‌بن، ئه‌و سه‌رجه‌می ئه‌مانه‌ت بۆ ئامـاده‌ و دابـین بكـات و، بـه‌: "دانایی" و "چاودێری" و "میهره‌بانی" له‌ كاتی پێویست و شیاودا بیاننێرێت، بـه‌ ڕاده‌یـه‌ك كـه‌ ئاگای له‌ ئاره‌زووی گه‌ده‌ی تۆیه‌ له‌وه‌دا كه‌ ژیان و مانه‌وه‌ت بۆ مسۆگه‌ر بكـات و، گوێیشـی له‌و نزا تایبه‌ت و هه‌نده‌كی‌یه‌ی گـه‌ده‌یه‌ كه‌ بۆ ڕزق و ڕۆزیی پێویستی ده‌ری ده‌بڕێـت و، بـه‌و خوارده‌مه‌نی‌یـه‌ بـه‌تام و لـه‌زه‌تـه‌ خـۆش و له‌ژماره‌به‌ده‌رانـه‌ - كـه‌ لـه‌سـه‌ر زه‌وی‌دا بـڵاوی كردوونه‌ته‌وه‌ - گیرابوونی ئه‌و دوعایه‌ی گه‌ده‌ی ئاشكرا كردووه‌ و دڵنیایی پێ به‌خشیوه‌!..

ئایا ده‌گونجێ ئه‌م كارسازه‌ به‌توانایـه‌: تـۆ نه‌ناسێت و، نـه‌تبینێت و، هۆكـاره‌ پێویسته‌كانی مـه‌زنترین ئامانجـی مـرۆڤ - كـه‌ ژیـانی هه‌میشـه‌یی‌یه‌ - ئامـاده‌ نـه‌كات و، گـه‌وره‌تـرین و

گرنگترین و گشتیترین دوعا و نزای مرۆڤ کە نزای مانەوە و هەتاهەتاییی‌یە، بە دروست نەکردنی ژیانی ئەودنیا و بەدی‌نەهێنانی بەهەشت گیرا نەکات و، ئەم نزا و لالانەوەیەی مرۆڤ – کە بەرزترینی بوونەوەرانی گەردوونە، تەنانەت پادشا و ئەنجام و پوختەی گۆی ئەم زەوی‌یەیە – نەبیستێت، کە نزایەکە لە قوولایی ناخیەوە دەرچووە و عەرش و فەرشی هەژاندووە؟! ئایا دەگونجێ بە ئەندازەی ئەو بایەخەی کە بە دوعای گەدەی مرۆڤی دا، بایەخ بەم دوعا مەزنە نەدات و مرۆڤ ڕازی نەکات و، "دانایی" کامڵ و "میهرەبانی"ی ڕەهای خۆیشی ڕووبەڕووی ئینکاری لێکردن بکاتەوە؟ نەخێر.. هەزار جار نەخێر.

ئایا دەچێتە عەقڵەوە ئەو خواوەندە بەتوانایەی کە کزترین دەنگی نزمترین بەش لە ژیاندا ببیستێت و، گوێ لە سکالای ڕابگرێت و، پاشان بە هانایەوە بڕوات و، بە نەرمونیانی ڕەفتاری لەگەڵ بنوێنێت و، بە گرنگی‌یەکی لەڕادەبەدەر و چاودێری‌یەکی تەواوەتی، پەروەردە و سەرپەرشتیی بکات و، گەورەترین بەدیهێنراوانی گەردوونیشی بۆ ژێربار بخات.. کەچی هەر ئەو خواوەندە بەتوانایە گوێی لە دەنگێك نەبێت کە وەك نەعرەتەی هەوری ئاسمان وایە و، داوای گەورەترین و بەرز و بالاترین و نەرمونیانترین و بەردەوامترین ژیان دەکات؟.. ئایا دەچێتە عەقڵەوە بایەخ بە دوعا گرنگەکەی نەدات کە دوعای مانەوەیە و، ئاوڕی میهرەبانی لە تکا و نزا و لالانەوەکەی نەداتەوە و، وەك ئەو کەسەی لێ بێت کە بەوپەڕی بایەخ پێدان و چاودێری‌یەوە تەنها یەك سەرباز پڕچەك بکات و کەرەسە و تفاقی پێویستی بۆ فەراهەم بهێنێت.. بەڵام چاودێریی سوپایەکی گەورە و زۆری خۆی نەکات؟ یان وەك ئەو کەسەی کە گەردیلەیەك ببینێت، بەڵام خۆر نەبینێت؟ یان وەك ئەوەی دەنگی ویزەی مێش ببیستێت، بەڵام نەعرەتەی هەوری ئاسمان نەبیستێت؟! نەخێر.. سەد هەزار جار نەخێر..

ئایا بە هیچ جۆرێك دەچێتە عەقڵەوە کە خواوەندی بەتوانای، دانای، خاوەنی میهرەبانیی فراوان و خۆشەویستیی لەسنووربەدەر و بەزەیی گشتی.. ئەم خوایەی کە سنعەتی خۆی گەلێ خۆش دەوێت و، بەم سنعەتەشی خۆی لە لای بەدیهێنراوانی خۆشەویست دەکات.. ئەم خوایەی کە سەبارەت بەوانەی خۆشیان دەوێت ئەم ئەوانی زیاتر خۆش دەوێتەوە.. ئایا دەچێتە عەقڵەوە ئەم خواوەندە لەناو هەموو بەدیهێنراوانی‌دا "ژیان"ی کەسێك بە تەواوەتی لەناو ببات کە هەر ئەوە لەچاو ئەوانی تردا پتر خوای خۆش دەوێت و، خۆشویستراوی خوای گەورە خۆیەتی و، شایستەی خۆش ویستنە و، هەر بە سروشت بەدیهێنەری خۆی دەپەرستێت؟.. هەروەها کاکڵەی "ژیان"یش کە "ڕۆح"ە، بە: مردنی هەمیشەیی و ئیعدامی هەتاهەتایی لەناو ببات و، وەڕسی و بێزاری بخاتە نێوان خۆی و خۆشەویستانیەوە و،

ئـازارێكی سـه‌ختیان ده‌رخـوارد بـدات و، بـه‌م كـاره‌ش نـهێنیی "میــهره‌بانی" و نــووری "خۆشه‌ویستی"ی خۆی گرفتاری ئینكاری كردن بكات؟! نه‌خێر.. سه‌د هه‌زار جار نـه‌خێر.. چونكه بێ هیچ گومانێك: ئه‌و "جوانی‌یه ڕه‌هـا"یـه‌ی كـه بـه دره‌وشـانه‌وه‌ی خـۆی ئـه‌م گه‌ردوونه‌ی ڕازاندووه‌ته‌وه و.. ئه‌و "میـهره‌بانی"یـه‌ش كـه سـه‌رجه‌می بوونـه‌وه‌رانی دڵخـۆش كـردووه و ئارایشـــی داون.. ئـه‌م دوانـه، تـابلێی لـه‌م توندوتیـژی و، ســه‌ختی و، ئه‌نجامـه ناشیرین و سته‌مه ڕه‌هایه دوور و خاوێنن.

**ئه‌نجام:**

مادهم له دنیادا "ژیان" هه‌یه، ئه‌وا بێ هیچ گومانێك، ئه‌و مرۆڤانه‌ی پەی به نـهێنیی "ژیـان" ده‌به‌ن و بـه هه‌ڵـه نایخه‌نــه‌كار، شایسـته‌ی "ژیـانێكی" هه‌میشـه‌یی نـاو خانـه و به‌هه‌شـتێكی هه‌تاهه‌تایین.. آمنّا.

* * *

پاشـان هـه‌روه‌ك پرشـنگدانه‌وه‌ی مـادده بریسـكه‌داره‌كانی ســه‌ر ڕووی زه‌وی و كـه‌ف و بڵقه‌كانی سه‌ر ڕووی ده‌ریاكان و، ئنجا كوژانه‌وه‌ی پرشنگ و بریسـكانه‌وه‌كانیان بـه نـه‌مانی ئه‌و بڵق و كه‌فانه و، پاشان بریسكانه‌وه‌ی ئه‌وانه‌ی كه دوای خۆیان دێن، به چه‌شنێك كه وه‌ك بڵێـی هــه‌موویان ئاوێنــه‌ی چــه‌ند خۆرێكــی میســالی بــن. هــه‌روه‌ك ئه‌مانـه، بــه ڕوونـــی و بەڵگه‌نه‌ویسـتی، ده‌ری‌ده‌خــه‌ن كــه ســه‌رجه‌می ئــه‌و بریســكانه‌وه یــه‌ك لــه دوای یه‌كانــه دره‌وشانه‌وه‌ی تیشكی ته‌نها یه‌ك "خۆر"ی به‌رز و مه‌زنن و، بـه چـه‌ندین زمـانی جیاجیـا یـادی خۆر ده‌كه‌نه‌وه و، به په‌نجه نوورانی‌یه‌كانیان ئاماژه بۆ ئه‌و خۆره ده‌كه‌ن..

هــه‌روه‌ك ئــه‌م مــادده بریســكه‌دارانه‌ی ســه‌ر ڕووی وشــكایی و ده‌ریاكــانی زه‌وی ئــه‌م ڕاستی‌یه‌یان به‌ده‌سته‌وه دا.. به هه‌مان جۆر، بریسكانه‌وه‌ی "ژیان" – بـه‌هۆی توانستی خـوای گه‌وره و دره‌وشانه‌وه‌ی ناوی: "المحيـي"ی ئـه‌و – لـه هـه‌موو گیـاندارانی سـه‌ر ڕووی زه‌وی و ده‌ریاكانی‌دا و، پاشان ون بوونی ئه‌و خاوه‌ن ژیانانه و ئاوابوونیان له پشـتی پـه‌رده‌ی غه‌یبـه‌وه، تاكو دوای ئه‌نجامدانی زیكری: "يا حيّ" بڕۆن و بواری هـاتن به‌وانـه‌ی دوای خۆیـان بـده‌ن.. هه‌موو یه‌كێك له‌مانه، شایه‌ت و ئاماژه‌یه‌كی بێ گومـانن له‌سـه‌ر "بوونـی ژیـانی هه‌میشـه‌یی" و "پێویستیی بوونی خواوه‌ندی زیندووی ڕاگیركه‌ری گه‌ردوون".

هه‌روه‌ها هه‌موو ئه‌و بەڵگانه‌ی شایه‌تی "زانست"ی خوای گه‌وره‌ن، ئه‌و زانسـته‌ی كـه لـه ڕێكخستنی كاروباری بوونه‌وه‌راندا ئاسه‌واره‌كانی به ئاشكرا ده‌بینرێن..

سەرجەمی ئەو بەڵگانەی کە "توانست"ی کارگێڕ و کارسازی خوای گەورە لە گەردووندا دەچەسپێنن..

گشت ئەو بەڵگانەی "ویست"ی خواوەند دەچەسپێنن، ئەو ویستەی کە بەسەر رێکخستن و بەڕێوەبردنی کاروباری گەردووندا زاڵ و فەرمانڕەوایە..

هەموو ئەو نیشانە و موعجیزاتانەی "ناردنی پێغەمبەران" – علیهم السلام – دەچەسپێنن، کە ناردنی ئەوانیش – خۆی لە خۆیدا – خولگە و بەڵگەی سیفەتی: "گوفتاری پەروەردگاری و وەحی‌ی خوای گەورە"یە..

سەرجەمی ئەو بەڵگانەی کە شایەتن لەسەر هەر حەوت سیفەتە مەزنەکانی خوای گەورە..

هەموو ئەو بەڵگە ناوبراوانە، هەروەك شایەتن لەسەر هەموو یەکێك لەوانەی باس کران، بە هەمان جۆر و بە یەکدەنگی، شایەت و بەڵگەیشن لەسەر: "ژیان"ی خواوەندی "حـيّ" و "قيّوم" واتە: زیندووی ڕاگیرکەری گەردوون.

چونکە هەر شتێك دارای "بینین" بێت، دەبێ دارای "ژیان"یش بێت.. گەر "بیستن"یشی هەبێت، ئەوە دیارە نیشانەی "ژیان"ە.. خۆ گەر "قسە" بکات، قسەکەی ئاماژەی بوونی "ژیان"یەتی.. گەر خاوەنی "ویست و ئیختیار"یش بێت، ئەوە دیاردەی "ژیان"ە..

بەم جۆرە، هەموو بەڵگەکانی ئەو سیفەتە مەزنانەی خوای گەورە، کە ئاسەواریان بە ئاشکرا دەبینرێت و بە بێ گومانی بوونی ڕاستەقینەیان دەزانرێت، چەشنی: توانستی رەها و، ویستی شامیل و، زانستی گشتگیر، هەموویان بەڵگەن لەسەر "ژیان"ی خواوەندی زیندووی ڕاگیرکەری گەردوون و، لەسەر "پێویستیی بوون"ی و، شایەتن لەسەر بوونی ئەو "ژیانە هەمیشەیی"یەی پەروەردگار کە تەنها بە یەك دانە تیشکی خۆی سەرجەمی گەردوونی ڕووناك کردووەتەوە و بە یەك دانە درەوشانەوەشی، ژیانی بە سەرتاپای ئەودنیا بەخشیوە، بە هەموو گەردیلەکانیەوە!

* * *

"ژیان" – بە هەمان جۆر – دەڕوانێتە پایەی ئیمانیی: "باوەڕ بە مەلائیکەت" و، دەبێت بە بەڵگە بۆی و، بە هێما دەیچەسپێنێت، چونکە:

مادەم "ژیان" گرنگترین ئەنجامی گەردوون بێت و.. "ژیانداران"یش لەبەر نرخ و بەهای بەرزیان لە هەموو بەدیهاتوان پتر بلاّو بن و زیاتر پەرە بسێنن و زۆر بن و، هەر ئەوانیش بن کە

یه‌ك له دوای یه‌ك و كاروان له دوای كاروان بۆ ناو ئـه‌م میوانخانه‌یـه‌ی دنیـا بێـن و دنیـا بـه‌وان ئاوه‌دان ببێته‌وه و شادی و دڵخۆشی ببه‌خشێت و..

مادەم گۆی زەوییش شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەم لافاوی زیندەوەرانەیە و.. هەمیشە بـەپێی حیکمەتی: نوێ کردنەوە و وەچەخستنەوە و زیادبوونی بـەردەوامیان، ئـەم زەوی‌یـە لـەوان پڕ دەکرێت و خاڵییش دەکرێتەوە و.. هـەردەم لـە شتانی بێ‌نرخ و گـەنیویش گیـانداری زۆر و زەبـەندە بـەدی دەهێنرێت، بـە ڕادەیـەك کـە گـۆی زەوی بـووە بـە پیشـانگایەکی گشـتی بـۆ سەرجەمی زیندەوەران و..

مادەم کاکڵە و پوختەی "ژیان" کە بریتی‌یە لە: "هەست و نەسـت" و "ژیـری" و "ڕۆح" - ئەو ڕۆحەی کە شتێکی نیانە و دارای جەوهەرێکی دامەزراوە - بـە زۆری‌یـەکی لەڕادەبەدەر لەسەر ئەم زەوی‌یەدا بەدی دەهێنرێن، بە چەشـنێك کـە دەڵـێی خـودی گـۆی زەوییـش دارای ژیانە و بە "ژیان" و "هەست" و "گیان" ڕازاوەتەوە..

مادەم هەموو ئەمانە وان، ئەوا هەرگیز ناگونجێ قەبارەکانی ئاسمان کـە لـەچاو زەویدا پـتر نیـان و زیـاتر ڕووناکـن و دارای گرنگی‌یـەکی گـەلـێ مـەزنترن، بـێ "گیـان" و "ژیـان" و "هەست و شعوور" بن! کەواتە، ئەوانەی وان لە ئاسمانەکاندا و، ئـەوێ ئـاوەدان دەکـەنەوە و، شـادی و زینـدەیی بـە خـۆر و ئەسـتێرەکان دەبەخشـن و، ئەنجـام و بـەری بەدیـهاتنی ئـەو ئاسمانانەن و، لەوێدا شەرەفمەندی گوفتاری خواوەند دەبـن.. هـەموو ئەوانـە، چـەند خـاوەن "هەسـت و شعوور" و "ژیان"ێکن و، نیشتەجێی لەبار و شیاوی ئاسمانـەکانن و بـەهۆی نـهێنیی "ژیان"ەوە لەوێ ئامادەن.. ئەمانەش بریتین لە: "مەلائیکەت".

* * *

هـەروەها نـهێنی و ماهییـەتی "ژیـان" دەڕوانێتـە پایـەی ئیمـانیی: "بـاوەڕ بـە پێغەمبـەران، درووديان لەسەر بێت" و، بە هێما دەیچەسپێنێت.

بەڵێ، مـادەم گـەردوون لـە پێنـاوی "ژیـان"دا بـەدی هێنـراوە و، "ژیـان"یـش گـەورەترین درەوشـانەوە و، تـەواوترین نـەخش و نیگـار و، جوانـترین سـنعەتی خـواوەندی "حـــيّ" و "قیّوم"ە و..

مـادەم "ژیانی هەمیشـەیی" ئـەو خواوەنـدەش بـە نـاردنی پێغەمبـەران - درووديـان لەسـەر بێـت - و نـازڵ کردنـی کتێبـەکان، خـۆی ئاشـکرا دەکـات، چونکـە گـەر "پێغەمبـەران" و

"کتێبەکانیان" نەبوونایە، هەرگیز "ژیانی ئەزەلی"ی خواوەندیش نەدەزانرا. ئەوەتا هەروەك قسە و ئاخاوتنی هەر کەسێك، زیندوویی و ژیانی ئەو کەسە دەردەخات، پێغەمبەران – درووودیان لەسەر بێت – و کتێبەکانیشیان بە هەمان جۆرن، ڕوونکەرەوە و بەڵگەن لەسەر ئەو خاوەن گوفتار و قسەکەرە زیندووەی کە بە وشە و گوفتارەکانی خۆی لە پشت پەردەی غەیبی داپۆشراوی پشت پەردەی گەردوونەوە، ئەمر و نەهی‌یەکانی ڕادەگەیەنێت.

کەواتە ئەو "ژیان"ەی وا لە گەردووندا، بەڵگەیەکی گومانبڕە لەسەر: "زیندوویی" و "پێویستیی بوون"ی زیندووی ئەزەلی، کە خوای گەورەیە. هەروەك تیشکەکانی "ژیانی ئەزەلی"ی خوای گەورە و درەوشانەوەکانیشی، بۆ هەموو ئەو شتانە دەڕوانن کە وابەستەی ئەو ژیانە ئەزەلی‌یەن وەك پایەکانی ئیمان، چەشنی: "ناردنی پێغەمبەران" و "نازڵ کردنی کتێبەکان" و، ئەم دوانە بە هێما دەچەسپێنن، بە تایبەت پێغەمبەرێتیی "حەزرەتی محەممەد ﷺ" و "وەحی"ی قورئانی پیرۆز. چونکە دەتوانرێت بوترێت: ئەم دوانە بە ئەندازەی ژیان چەسپاون. لەبەر ئەوەی هەردووکیان – کت و مت – وەك "ڕۆح" و "عەقڵ"ی "ژیان" وان.

بەڵێ، هەروەك "ژیان" پوختەیەکی داچۆڕاوی ئەم گەردوونەیە و..

"هەست و شعوور"یش چەند نمێکن لە ژیانەوە داچۆڕاون و پوختەی ژیانن و..

"ژیری"یش لە هەست و شعوورەوە داچۆڕاوە و پوختەی هەست و شعوورە و..

"گیان"یش پوختە و کاکڵەی بێ گەرد و خاوێن و، زاتی سەربەخۆی ژیانە..

هەروەك ئەمانە وان، بە هەمان جۆر "ژیان"ی – ماددی و مەعنەویی– حەزرەتی محەممەدیش ﷺ نم‌نم لە "ژیان" و لە "گیان"ی گەردوون و پێغەمبەرایەتی‌یەکەیشی لە "هەست و شعوور" و "ژیری"ی گەردوونەوە داچۆڕاون و پوختەی خاوێن و بێ گەردی ئەو گەردوونەن. تەنانەت ژیانی ماددی و مەعنەویی حەزرەتی محەممەد ﷺ – بە شایەتیی ئاسەوارەکانی ژیانی – "ژیانی گەردوون"ە و.. پێغەمبەرایەتی‌یەکەشی هەست و شعووری "شعووری گەردوون"ە و.. وەحیی قورئانی پیرۆزیش – بە شایەتیی ڕاستی‌یە زیندووەکانی – "گیان"ی ژیانی گەردوونە و، "ژیری"ی هەست و شعووریەتی!.. بەڵێ.. بەڵێ.. بەڵێ..

خۆ گەر "نووری پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ" گەردوون بەجێی بهێڵێت، ئەوا سەرتاپای گەردوون و بوونەوەران دەمرن و گیان لەدەست دەدەن و.. گەر "قورئانی پیرۆز"یش ماڵئاوایی لێ بکات و دوور بکەوێتەوە، ئەوا گەردوون بە جارێ شێت دەبێت و،

گۆی زەوییش عەقڵ و ژیریی لەدەست دەدات و، بە بێ هەست دەمێنێتەوە و، لە تاوا خۆی بـە هەسارەیەکی گەڕۆکی ئاسماندا دەکێشێت و، قیامەت بەرپا دەبێت!

* * *

هەروەها "ژیان" دەڕوانێتە پایەی ئیمانیی: "باوەڕ بە قەدەر" و، دەبێ بە بەڵگـە لەسـەری و، بە هێما دەیچەسپێنێت..

چونکـە مـادەم "ژیان" ڕووناکیی جیهـانی بینراو(عالم الشهادة) بێت و.. هـەموو لایـەکی ئەم جیهانەی گرتبێتەوە و بەسەریا زاڵ بووبێـت و.. ئـەنجام و ئامـانجی "بـوون" و.. فراوانـترین ئاوێنـەی درەوشـانەوەکانی بەدیهێنـەری گــەردوون و.. تــەواوترین پێرسـت و نموونــەی کـارایی(فعالیــة) خـوای پـەروەردگار بێـت، بە ڕادەیـەك کـە دەڵێـی "ژیـان" چەشنە پـلان و پرۆگرامێکە بۆ ئەو "کارایی"یەی پەروەردگار، گەر ئەم تەشبیهە دروست بێت..

مادەم وایە، ئـەوا نـهێنیی "ژیـان" داخـوازی ئەوەیـە کـە بـە هـەمان جـۆر "جیـهانی پەنـهانی غەیب"یش واتە: ڕابوردوو و ئـاینده، بـە واتایـەکی تـر: بوونـەوەرانی پێشـین و پـاش ئێسـتاش، دارای ڕێسا و ڕێکوپێکی بن و، زانراو و، بینراو و، دەستنیشـان کـراو و، ئامـادەی جێبـەجێ کردنی فەرمانە تەکوینییەکانی خواوەند بن. واتە: لە حوکمی ئەوەدا بن کە دارای "ژیانێکی مەعنەوی" بـن، چەشـنی "تـۆو"ی ئەسـڵی درەخـت و "نـاوك" و "بـەرەکان"ی کـە لـە کۆتـایی پەلـەکانی دان و دارای چـەند تایبەتکاریـیەکی "جـۆرە ژیـانێکی" تایبـەتیی کتومـت وەك "ژیان"ی درەختەکەیانن، تەنانەت هەندێ جار ئەو تۆوانـە چـەند یاسـایەکی گەلـێ وردتر لـە هی "ژیانی خودی درەختەکە" لە خۆیاندا هەڵدەگرن.

جا هـەروەك ئـەو تۆوانـەی کـە ئەسڵی درەختن و پایزی پێشـوو بـەجێی هێشـتن و، ئـەو تۆوانەش کە ئەم بەهارە نوێیە پاش خۆی بەجێیان دەهێڵێـت، بـەپێی چـەند یاسـایەکی لەمـەڕ "ژیان" دەڕۆن و ڕووناکیی "ژیان" لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن، چەشنی ئەو "ژیـان"ەی کـە ئـەم بەهارە هەڵی گرتووە.. درەختی بوونەوەرانیش بە هەمان جـۆرە، هـەموو پـەل و لقێکـی دارای ڕابـوردوو و داهـاتووی خۆیـەتی و خـاوەنی زنجیرەیـەکی وەهایـە کـە لـە چـەندین بـارودۆخی ڕابوردوو و داهاتوو پێکـهاتووە و، هـەموو جۆر و بەشێکیشـی لـە زانیـاریی خـوای گـەورەدا خاوەنی چەند "بوون"ێکە بە چەند تەرزێکی جیاجیا. بەمەش زنجیرەی بوونی زانستی (الوجود العلمـي) پێکدەهێنـن. ئـەم بوونـە زانسـتییەش کـە لـە بوونـی دەرەکـی دەچێـت، جێــی

لێ‌درەوشانەوە و، لێ‌دەرکەوتنی مەعنەویی ژیانە گشتی‌یەکەیە، چونکە ئەو چارەنووسانەی کە بۆ "ژیان" تەقدیر کراون لەو لەوحە قەدەری‌یە مەزنە پڕ واتایانەوە وەردەگیرێن.

بەڵێ، پڕبوونی "جیهانی ڕۆح" - کە جۆرێکی جیهانی غەیبە - لەو ڕۆحانەی کە لە ڕاستی‌دا: خود و ماددە و کاکڵە و زاتی "ژیان"ن، داخوازی ئەوەیە: ڕابوردوو و داهاتوویش - کە جۆرێك و بەشێکی تری جیهانی غەیبن - "ژیان"یان تێدا بدرەوشێتەوە.. هەروەها ڕێکوپێکیی کامڵ و تەواوەتیی بار و شێوە پڕ واتا نیان و ناسکەکانی "بوونی زانستی"ی خوایی بۆ هەر شتێك و، ئەنجام و قۆناغە زیندەکارەکانی، دەری‌دەخەن کە ئەو شتە شایانی جۆرە ژیانێکی مەعنەوی‌یە.

بەڵێ، ئەم چەشنە درەوشانەوەیە، واتە درەوشانەوەی "ژیان" کە لە ڕاستی‌دا ڕووناکیی خۆری: "ژیانی ئەزەلی"یە، تەنها بەم جیهانە بینراوە و بەم کاتەی ئێستا و لەم بوونە دەرەکی‌یەدا بەند نی‌یە، بەڵکو هەموو یەکێك لە جیهانەکان - هەریەکەیان بەپێی لێهاتنی خۆی - ئەو ڕووناکی‌یەی ژیانی تێدا دەردەکەوێت.

کەواتە سەرجەمی گەردوون بە هەموو جیهانەکانیەوە، بە لێ‌دەرکەوتن و درەوشانەوەی خۆری "ژیانی ئەزەلی" بووە بە گەردوونێکی زیندوو و تیشك بەخش و ڕووناك. دەنا هەموو یەکێ لەو جیهانانە، لە ژێر پەردەی ئەم دنیا کاتی و ڕواڵەتی‌یەدا، دەبن بە تەرمێکی زەبەلاحی سامناك و جیهانێکی کاوڵی تاریك، وەك ئەوەی کە گومڕایانی بێ‌بەش لە نووری ئیمان دەیبینن.

بەم جۆرە، مرۆڤ لە ڕێی نهێنیی "ژیان"ەوە، لە ڕوویەکی "ئیمان بە قەدەر" تێ‌دەگات و، بەو نهێنی‌یەی "ژیان" ئیمان بە "قەدەر"ی لە لا دەچەسپێت و بۆی ڕوون دەبێتەوە. واتە هەروەك زیندەیی "جیهانی بینراو" و بوونەوەرەکانی کاتی "ئێستا" بە: ڕێکوپێکیان و ئەنجامەکانیان، دەردەکەوێت.. بە هەمان جۆر بوونەوەرەکانی "پێشین" و ئەوانەش کە "لەمەولا" دێن و بە "جیهانی پەنهانی غەیب" دادەنرێن، دارای بوونێکی زیندووی مەعنەوی و خاوەنی چەسپاوی‌یەکی زانیاریی گیاندارن، بە چەشنێ کە بەناوی "موقەددەرات"ەوە، ئاسەوارەکانی ئەو ژیانە مەعنەوی‌یە، لە ڕێی لەوحی قەزا و قەدەرەوە دەردەکەون و ئاشکرا دەبن.

* * *

## پارچەی سێهەمی

### پاشکۆی وتەی دەهەم

**پرسیارێك بە بۆنەی باسی حەشرەوە:**

ئەو باسەی کە چەندین جار لـە قورئانی پیرۆزدا کراوە، وەك: ﴿**إنْ كانتْ إلاّ صيحةً واحدةً**﴾ (يس:٢٩)، ﴿**وما أمرُ السّاعةِ إلاّ كلمحِ البصرِ**﴾ (النحل:٧٧) ئەوەمان بۆ دەردەخات کە حەشری مەزن ئەوەندە بە کتوپڕی پەیدا دەبێت کە "کات" لـە کایەدا نامێنێت. بەڵام ژیریيە تەسکەکانی ئێمە داوای چەند نموونەیەکی هاووێنە و بینراو دەکەن، تاکو بە دڵنیایی مل بۆ ئەو ڕووداوە نائاسایی و ناوازەیە کەچ بکەن.

**وەڵام:**

"حەشر" سێ مەسەلەی تێدایە کە ئەمانەن:

گەڕانەوەی گیانەکان بۆ ناو جەستەکانیان.. زیندوو کردنەوەی جەستەکان.. دروست کردنەوە و بنیاتنانەوەی سەرلەنوێی ئەو جەستانە.

**مەسەلەی یەکەم:** هاتن و گەڕانەوەی گیانەکان بۆ ناو جەستەکان.

نموونەی ئەمە، وەك: کۆ کردنەوەی ئەو سەربازانەی کە لە ماوەی پشوودانیاندا بە هەموو لایەکدا بڵاو بوونەتەوە تەنها بە دەنگی لێدانی "شەیپووری سەربازی".

بەڵێ، هەروەك "صور" کە شەیپووری حەزرەتی ئیسرافیلە - درووودی لەسەر بێت - هیچی لـە شەیپووری سەربازی کەمتر نییە.. گوێڕایەڵیی گیانەکانیش کە وان لـە لای ئەبەدەوە و لە جیهانی گەردیلەکاندان و، کاتێ کە بانگی ﴿**ألَسْتُ بربّكم**﴾یان لـە قووڵایی ناخی ئەزەلەوە بیست، بە: ﴿**قالوا بلى**﴾ (الأعراف:١٧٢) وەڵامیان دایەوە.. بێ هیچ گومانێك، گوێڕایەڵی و ڕێسای ئەم گیانانە گەلێ زیاترە لـەچاو گوێڕایەڵی و ڕێسای سەربازەکانی هەر سوپایەکی ڕێکوپێك.

"وتەی سێهەم" بە چەندین بەڵگەی بەهێزی گومانبڕ چەسپاندی کە نەك تەنها "گیانەکان" سوپایەکی ڕێکی خوای گەورەن، بەڵکو هەموو گەردیلەکانیش سەربازی

گوێڕایەڵی ئەو سوپایەی ئەون و، ئامادە و چاوەڕوانی فەرمانن بۆ هەر هێرشێکی گشتی کە پێیان بسپێررێت ئەنجامی بدەن.

**مەسەلەی دووهەم:** زیندوو کردنەوەی جەستەکان.

نموونەی ئەمە وەك ئەوەی کە: دەکرێت لە شەوی میهرەجانی شارێکی مەزندا، تەنها لە یەك مەڵبەندەوە و بە یەك چاوتروو کاندن، وەك بڵێی کات هەر لە گۆڕێدا نەبێت، سەدان هەزار گڵۆپی کارەبایی دابگرسێنرێن.. هەروەك ئەمە دەکرێت، دەشتوانرێت - بە هەمان جۆر - لە تەنها یەك مەڵبەندەوە، سەدان ملیۆن چرای زیندەوەران دابگرسێنرێن و زیندوو بکرێنەوە. چونکە مادەم کارەبا، کە یەکێکە لە بەدیهێنراوانی خوای گەورە و خزمەتکارێکی رووناکی بەخشە لەم میوانخانەیەی ئەودا، دارای تایبەتکاریی ئاوا بێت و بتوانێت بەپێی ئەو نەخشە و ڕێسایەی لە لایەن بەدیهێنەریەوە بۆی دیاری کراوە، کارەکانی ڕاپەڕێنێت، ئەوا دەبێ حەشری مەزن، لە نێوان ئەو یاسا خواییيانەدا کە هەزاران خزمەتگوزاری رووناکی بەخشی وەك کارەبا دەریاندەخەن و ئاشکرایان دەکەن، لە خێراییيەکی چەشنی چاوتروو کاندندا ڕووبدات.

**مەسەلەی سێهەم:** بنیاتنانەوەی کتوپڕیی جەستەکان.

نموونەی ئەمە وەك: دروست کردن و بنیاتنانی گشت درەخت و گەڵاکان کە ژمارەیان هەزار جار لە ژمارەی کۆی ئادەمیزاد زیاترە، بنیاتنانی هەموو ئەمانە بە یەك جار و بە شێوەیەکی تەواو و بە هەمان شێوەی بەهاری پێشوو تەنها لە ماوەی چەند ڕۆژێکی بەهاردا.. هەروەها وەك بەدیهێنانی هەموو گوڵ و بەر و گەڵاکانی گشت درەختێك بەوپەڕی خێرایی، بە چەشنی بەهاری پێشوو.. هەروەها وەك بێداربوونەوە و دەرکەوتن و زیندووبوونەوەی هەموو تۆو و ناوکە لەژمارەبەدەرەکان لە یەك کاتدا، کە هەر ئەمەیشە بەهاری لێ پێکدێت.. هەروەها وەك زیندووبوونەوەی جەستە مەزن و کەتە و لەسەر پێ ڕاوەستاوی درەختەکان و گوێڕایەڵیی کتوپڕی و خێرایان بۆ فەرمانی "البعث بعد المـــوت".. هەروەها وەك زیندوو کردنەوەی یەك بە یەکی تاکەکانی هەموو جۆرەکانی زیندەوەرە وردە لەژمارەبەدەرەکان بەوپەڕی وردەکاری و ڕێکوپێکی.. هەروەها وەك زیندوو کردنەوەی گشت جۆرەکانی "مێروو" بە تایبەت مێش (کە وا لە بەرچاوماندا و، هەمیشە بە پاککردنەوەی دەست و چاو و باڵەکانی دەستنوێژمان دەخاتەوە یاد و یاری لەگەڵ دەم و چاوانماندا دەکات) کە تەنها ژمارەی ئەوانەیان کە لە یەك ساڵدا زیندوو دەکرێنەوە لە چاو

ژماره‌ی مرۆڤ هه‌ر له‌ حه‌زره‌تی ئاده‌مه‌وه - درووده‌ی له‌سه‌ر بێت - تا ئێستا، گه‌لێ زیاتره. زیندوو كردنه‌وه‌ی ئه‌م مێرووه و مێرووه‌كانی تر هه‌موو ساڵێك ته‌نها له‌ چه‌ند ڕۆژێكی به‌هاردا، نه‌ك ته‌نها یه‌ك نموونه، به‌ڵكو هه‌زاران نموونه‌مان به‌ده‌سته‌وه ده‌ده‌ن بۆ زیندوو بوونه‌وه‌ی جه‌سته‌ی مرۆڤ به‌ كتوپڕی و خێرایی له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا.

به‌ڵێ، مادەم دنیا خانه‌ی دانست(حیكمه‌ت) و ئه‌ودنیاش خانه‌ی توانست(قودره‌ت)ه، ئه‌وا به‌دیهێنانی هه‌ر شتێك له‌م دنیادا به‌ هه‌ندێ كات و له‌سه‌رخۆیی و هه‌نگاو له‌ دوای هه‌نگاو ئه‌نجام ده‌درێت. ئه‌مه‌ش به‌پێی خواستی "دانست"ی په‌روه‌ردگار و به‌ گوێره‌ی داخوازیی زۆربه‌ی ناوه‌ جوانه‌كانی چه‌شنی: "الحكيم، المرتب، المدبر، المربي". به‌ڵام له‌ودنیادا "توانست" و "میهره‌بانی" زیاتر ده‌رده‌كه‌ون تا "دانست". كه‌واته‌ پێویست به‌ مادده‌ و ماوه‌ و كات و چاوه‌ڕوانی ناكات، چونكه‌ له‌وێ هه‌موو شتێك كتوپڕی دروست ده‌بن. ئه‌و خێراییه‌ش كه‌ ئایه‌تی: ﴿**وما أمرُ السَّاعةِ إلاَّ كلمحِ البصرِ أو هو أقربُ**﴾ ئاماژه‌ی بۆ ده‌كات، ئه‌وه‌ ده‌گه‌یه‌نێت كه‌: هه‌ر شتێك لێره‌دا به‌ ماوه‌ی ڕۆژێك یان ساڵێك دروست ده‌كرێت، له‌ودنیا له‌ ماوه‌ی چركه‌یه‌كی چه‌شنی چاو تروو كاندنێكدا به‌دی ده‌هێنرێت.

گه‌ر حه‌ز ده‌كه‌یت تێبگه‌یت له‌وه‌ی كه‌ هاتنی حه‌شر وه‌ك هاتنی به‌هاری داهاتوو كارێكی حه‌تمی و بێ گومانه، ئه‌وا به‌ وردی سه‌یری: "وته‌ی ده‌هه‌م" و "وته‌ی بیست و نۆهه‌م" بكه. ئنجا گه‌ر دوای خوێندنه‌وه‌ی ئه‌و دوو وته‌یه، به‌ ئه‌ندازه‌ی باوه‌ڕبوونت به‌ هاتنی به‌هاری ئاینده‌ له‌ هاتنی حه‌شریش دڵنیا نه‌بوویت، ده‌توانیت په‌نجه‌م بگریت و لێپرسینه‌وه‌ی سه‌ختم له‌گه‌ڵ بكه‌یت!

**مه‌سه‌له‌ی چواره‌م:** مردنی دنیا و به‌رپابوونی قیامه‌ت.

نموونه‌ی ئه‌مه‌ وه‌ك ئه‌وه‌ی كه: ئه‌گه‌ر هه‌ساره‌یه‌كی گه‌ڕۆك یان ئه‌ستێره‌یه‌كی كلكدار، به‌ فه‌رمانی خوای گه‌وره، به‌ر گۆی زه‌ویمان بكه‌وێت، كه‌ میوانخانه‌كه‌ی ئێمه‌یه.. ئه‌وا ئه‌م خانه‌ و لانه‌یه‌ی - زه‌ویمان - ده‌ڕمێنێت، به‌ چه‌شنی ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ ماوه‌ی یه‌ك خوله‌كدا كۆشكێك ده‌ڕووخێنرێت كه‌ به‌ ده‌ ساڵ بنیات نرابێت.

* * *

## پارچەی چوارەمی

### پاشکۆی وتەی دەهەم

﴿قالَ مَنْ يُحْيِ العِظامَ وهيَ رَميم ۞ قُلْ يُحييها الّذي أَنْشأَها أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عليم﴾(يس:٧٨-٧٩)

واتە: مرۆڤ دەڵێت: کێ ئەو ئێسکە ڕزیوانە زیندوو دەکاتەوە؟ تۆ بڵێ: ئەو کەسەی کە یەکەم جار بەدیی‌هێنا و ژیانی بە بەردا کرد، هەر ئەویش زیندووی دەکاتەوە.

لە نموونەی سێهەمی ڕاستیی نۆهەمی وتەی دەهەمدا وتراوە کە:

ئەگەر یەکێك پێی‌وتیت: (کەسێکی مەزن هەیە لەو کاتەدا کە هەر لە بەرچاوی خۆماندا سوپایەکی مەزن لە یەك ڕۆژدا پێکدەهێنێت، هەر ئەو کەسە تەنها بە فوویپیاکردنێکی شەیپووری سەربازی دەتوانێت یەك لەشکری تەواوی ئەو سەربازانەش کۆ بکاتەوە کە بۆ حەوانەوە لەم لا و لەو لادا بڵاو بوونەتەوە و، لە ژێر ئاڵا و ڕێسای لەشکرەکەی‌دا ئامادە و جەمیان بکات).. تۆیش لە وەڵامی ئەودا پێت وت: (نەخێر.. باوەڕ ناکەم بتوانێت کاری وا ئەنجام بدات). ئایا ئەم وەڵام و ئینکاری‌یەت بە شێتی و گێژی و گەلحۆیی لە قەڵەم نادرێت؟

هەر بەو جۆرەش ئەو کەسەی کە لە نەبوونەوە جەستەی گشت گیانداران و سەرجەمی زیندەوەرانی بەدی هێناوە، ئەو جەستانەی کە وەکو لەشکری سەربازیی ئەو بوونەوەرانەن کە ئەوانیش لە سوپای مەزن دەچن و.. پاشان هەموو گەردیلەکان و لایەنە نەرمونیانەکانی ئەوانی بە ڕێسایەکی کامڵ و تەرازوویەکی دانا و بە فەرمانی: ﴿کُـــن فیکـــون﴾ لە شوێنی شیاوی خۆیاندا داناوە.. ئەو کەسەی کە لە هەموو سەدەیەك بەڵکو لە هەموو بەهارێکدا سەدان هەزار جۆر تیرە و تاقمی زیندەوەران بەدی دەهێنێت کە وەك سوپا وان.. ئایا دەگونجێ پرسیار لە بارەی ئەم کەسە بەتوانا و زانایەوە بکرێت و بوترێت: چۆن تەنها بە هاوار و فوویەکی ئیسرافیل بە شەیپوورەکەی‌دا، سەرجەمی گەردیلە سەرەکی‌یەکان و بەشە بنەڕەتی‌یەکانی ئەو سەربازە یەکترناسانە کۆ دەکاتەوە لە ژێر ئاڵا و سایەی ڕێسای لەشکری لەشدا؟! ئایا دەگونجێ ئەم کارە لەو کەسە بەتوانا و زانایەوە بە دوور بزانرێت؟ ئایا بەدوور زانینی ئەم کارە لەو خواوەندە بەتوانا و زانایە، نیشانەی گەلحۆیی و بەڵگەی شێتی نی‌یە؟

هەروەها قورئانی پیرۆز هەندێ لە کارە دەراسا و ناوازەکانی خوای گەورە لە دنیادا، باس دەکات، تاکو زەینەکان بۆ تەسدیق و دڵانیش بۆ باوەڕ کردن ئامادە بن سەبارەت بە

كـاره ده‌راسـاكانى خـۆى كـه سـه‌ر بـه دوارۆژن.. يـاخود ئـه‌و كـار و فرمانـه خواييـيـه سـه‌رسوورهێنانه‌ى كـه لـه دوارۆژ و قيامه‌تـدا ڕوو ده‌ده‌ن بـه جۆرێـك بـاس ده‌كـات كـه قه‌ناعه‌ت و دڵنياييـمان بداتێ، به‌هۆى ئه‌و هاووێنه زۆرانه‌ى كه له دنيادا ده‌يانبينين.

بۆ نموونه:

﴿أَوَلَمْ يَرَ الإِنسانُ أَنّا خلقناهُ مِنْ نُطفَةٍ فإذا هوَ خصيـمٌ مبـين﴾ تـا كۆتـايى (سـووره‌تى ياسين).

لێره‌دا قورئانى پـيرۆز كێشـه‌ى حه‌شر بـه حـه‌وت هه‌شـت شێوه‌ى جياجيـا و جۆراوجـۆر ده‌چه‌سپێنێت و به‌ڵگه‌ى له‌سه‌ر ده‌هێنێته‌وه..

لـه سـه‌ره‌تادا "دروسـت بوونـى يه‌كـه‌م جـار" ده‌خاتـه پێش‌چاوى مـرۆڤ و، ده‌فـه‌رموێت: ئه‌وه‌تا به چاوى خۆتان ده‌بينن كه له ئاوى مه‌نى دروست ده‌بن و پاشان ده‌بن به زه‌روو، پاشان به پارچه‌يه‌ك گۆشت و ئنجا به مرۆڤ.. ئيتر چۆن "دروست بوونه‌وه‌ى دووه‌هم جار" به دوور ده‌زانن كه كتومت وه‌ك دروستبوونى يه‌كه‌م وايه، ته‌نانه‌ت له‌چاو يه‌كه‌مدا ئاسانتريشه؟..

پاشـان به: ﴿الذي جعلَ لكُمْ منَ الشَّجَرِ الأَخضَرِ ناراً﴾ (يس: ٨٠) ئامـاژه بـۆ ئـه‌و چـاكه و نيعمه‌ت و به‌خشايشـانه ده‌كـات كـه خـواوه‌نـدى حـه‌ق بـه‌م مرۆڤـه‌ى به‌خشـيون. كه‌واتـه ئـه‌و كه‌سه‌ى ئه‌م چه‌شنه نيعمه‌تانه‌ى پێ به‌خشيون، هـه‌رگيز ده‌سـتبه‌ردارتان نـابێت تـا هـه‌ر وا بـێ لـێپرسينه‌وه بڕۆنه ناو گۆڕه‌كانتان و تياى‌دا بخه‌ون و هه‌ڵنه‌سنه‌وه.. پاشان به هێما ده‌فـه‌رموێ: ئێوه زيندوو كردنه‌وه و سه‌وزبوونه‌وه‌ى دره‌خته مردووه‌كان بـه چـاوى خۆتـان ده‌بينـن، ئـه‌دى بۆچى به‌لاتانه‌وه دووره كه ئه‌و ئێسكانه‌ى وه‌ك ته‌خته و دارى بێ‌گيانيان لـێ هـاتووه ژيانيـان تێدا په‌يدا ببێته‌وه و بۆچى قياسى ئه‌و ئێسكانه ناكه‌نه سه‌ر دره‌خته مردووه‌كان؟..

پاشان ئايا ده‌گونجێ ئه‌و كه‌سه‌ى ئاسمانه‌كان و زه‌ويى به‌دى هێناوه، له زينـدوو كردنـه‌وه و مراندنى مرۆڤدا - كه به‌رى دره‌ختى زه‌وى و ئاسمانه‌كانـه - كۆڵـه‌وار و ده‌ستـه‌وسـان بێـت؟.. يان ئايا ده‌گونجێ ئه‌و كه‌سه‌ى كه هه‌موو كارێكى دره‌خت به‌ڕێوه ببـات و چـاودێريى بكـات، بـه‌ڵام بـه‌رى ئـه‌و دره‌ختـه پشـت‌گوێ بخـات و فه‌رامۆشـى بكـات بـۆ كه‌سـانى تـر؟ ئايـا لـه‌و گومانه‌دان: "دره‌ختى به‌ديهاتووان" كـه هـه‌موو به‌شـێكى بـه هـه‌ويرى "دانـايى" شـێلراوه، بـۆ بێ‌مه‌به‌ستى و بێ‌هووده‌يى وازى لـێ بهێنرێت و ده‌ستى لـێ هـه‌ڵبگيرێت و بـه‌ر و ئه‌نجامـه‌كانى پشتگوێ بخرێت؟!

كه‌واتـه ئـه‌و كه‌سـه‌ى دوايـى لـه حه‌شـردا زيندووتـان ده‌كاتـه‌وه، هـه‌ر ئـه‌و كه‌سـه‌يه كـه كاروبـارى ئاسمانـه‌كان و زه‌ويى بـه ده‌سته و، سـه‌رجه‌مى بوونـه‌وه‌رانيش چه‌شنى سـه‌ربازى

گوێڕایەڵ ملکەچی فەرمانی ئەون و، هەموو ئەوانەی بە تەواوەتی و لە ڕێی فەرمانی: ﴿كُنْ فيكون﴾ەوە بۆ کار و فرمانەکانی خۆی ژێربار خستووە.. ئەو کەسەی کە بەدیهێنانی بەهاری بەلاوە بە ئەندازەی بەدیهێنانی یەك تاقە گوڵ و، دروست کردنی سەرجەمی زیندەوەرانیش بەلای توانستیەوە بە قەدەر دروست کردنی یەك دانە مێش ئاسانە.. جا کەسێك کە خاوەنی توانستێکی وەهابێت هەرگیز پێی‌ناوترێت: ﴿مَنْ يُحي العظامَ﴾؟

پاشان بە دەستەواژەی: ﴿فَسُبحانَ الّذي بيده مَلَكوتُ كلِّ شيءٍ﴾ (يس:٨٣) دەری دەخات کە: هەر تەنها خوای گەورەیە کاروبار و کلیلی هەموو شتێکی بەدەستە و بەوپەڕی ئاسانیی چەشنی هەڵگێڕانەوەی لاپەڕەی کتێب، شەو و ڕۆژ و زستان و هاوین ئاڵوگۆڕ دەکات و، دنیا و قیامەتیش لای ئەو وەك دوو مەنزڵ وان کە دەرگای یەکێکیان دابخات و ئەوی تریشیان بکاتەوە. جا مادەم وایە، ئەوا ئەنجامی گشت ئەو بەڵگانەی پێشوو بریتی‌یە لە: ﴿وإليهِ تُرجَعُون﴾ واتە هەر ئەویشە کە لە گۆڕەکانتاندا زیندووتان دەکاتەوە و بەرەو حەشر دەتانبات و لە دیوانی خاوێنی خۆیشی‌دا حسابی خۆتان دەداتێ.

بەم جۆرە، دەبینیت ئەم ئایەتانە (بەوەی کە: هاووێنەی حەشریان لە دنیادا، خستە ڕوو) زەین و دڵانیان بۆ وەرگرتنی کێشەی حەشر ئامادە کرد.

هەندێ جاری تریش قورئانی پیرۆز کارە قیامەتی‌یەکان بە شێوەیەك باس دەکات کە چاوی هەستی مرۆڤ بکاتەوە و ئاماژەی بۆ هاوچەشنەکانی ئەو کارە سەر بە قیامەتی‌یانە بۆ بکات کە لە دنیادا هەن تاکو ڕێی ئینکاری کردن لە مرۆڤ بگرێت و بەدوورزانین لە زەینی‌دا لابدات. بۆ نموونە:

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إذا الشّمسُ كُوِّرَتْ ❁ وإذا النجومُ انكدرَتْ ❁ وإذا الجبالُ سُيِّرَتْ ❁ وإذا العِشارُ عُطِّلتْ ❁ وإذا الوحوشُ حُشِرَتْ ❁ وإذا البحارُ سُجِّرتْ ❁ وإذا النفوسُ زُوِّجتْ ❁ وإذا المَوؤدةُ سُئلتْ ❁ بأيِّ ذنب قُتِلتْ ❁ وإذا الصُحُفُ نُشِرَتْ ❁ وإذا السَّماءُ كُشِطتْ ❁ وإذا الجحيمُ سُعِّرَتْ ❁ وإذا الجَنّةُ أُزْلِفتْ ❁ عَلِمَتْ نَفْسٌ ما أَحضرَتْ﴾ تا کۆتایی سوورەتەکە.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إذا السّماءُ انفطرتْ ❁ وإذا الكواكبُ انتثرتْ ❁ وإذا البحارُ فُجِّرَتْ ❁ وَإذا القبورُ بُعثرتْ ❁ علمتْ نفسٌ ما قَدّمتْ وأخرّتْ﴾ تا کۆتایی سوورەتەکە.

بسم الله الرحـــمن الرحيم

**﴿إذا السّماءُ انشقّتْ ❁ وأَذنَتْ لربِّها وحُقَّتْ ❁ وإذا الأَرضُ مُدَّتْ ❁ وأَلقَتْ ما فيـــها وتخلَّتْ ❁ وأَذنَتْ لربِّها وحُقَّتْ﴾** تا كۆتايی سوورەتەكە.

دەبینیت ئەم سوورەتانە بە تەرز و شێوازێك لە ئالوگۆڕە مەزن و كاروبارە گەورە پەروەردگاری‌یەكانی سەر بە حەشر دەدوێن كە دڵی مرۆڤ پابەندی سەرسووڕمانێكی گەورە و عەقڵیشی گرفتاری سەرسامی‌یەكی مەزن دەكەن.. بەڵام هەر ئەوەندەی مرۆڤ لە پایز و بەهاردا هاووێنەی ئەو ڕووداوانە بە چاوی خۆی دەبینێت، ئەوا بەوپەڕی ئاسانی وەری دەگرێت و باوەڕی پێ دەكات.

جا لەبەر ئەوەی تەفسیر كردنی ئەم سێ سوورەتە درێژە دەكێشێت، ئەوا بۆ نموونە تەنها وشەی: **﴿وإذا الصُحفُ نُشِرت﴾** وەردەگرین و لە بارەیەوە دەدوێین:

ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت كە: لە ڕۆژی حەشردا هەموو كردەوەكانی مرۆڤ لەسەر لاپەڕەیەكدا تۆمار كراون و دەخرێنە ڕوو. جا لەبەر ئەوەی ئەم مەسەلەیە شتێكی سەیر و سەرسووڕهێنەرە، عەقڵ پەیی پێ نابات. بەڵام سوورەتەكە هەروەك ئاماژە بۆ حەشری بەهارانە دەكات و، هەروەك خاڵ و لایەنەكانی تریش لە دنیادا هاووێنەیان هەیە، بە هەمان جۆر "خستنەڕووی لاپەڕەی كردەوەكانی مرۆڤیش" هاووێنەیان لەم دنیایەدا ئاشكرایە، ئەوەتا هەموو: بەر و، گیا و، درەختێك خاوەنی كردەوە و، فەرمانبەری و، بەندایەتی و، تەسبیحاتی تایبەتیی خۆیانن، بە شێوەیەك كە ناوە جوانەكانی خوای گەورەیان پێ دەربكەوێت. ئنجا سەرجەمی ئەم هەموو كارانەش لەگەڵ مێژووی ژیانی ئەم بەر و گیا و درەختەدا لە یەك بە یەكی ناوك و تۆوەكانی‌دا تۆمار كراون و هەر هەموویشیان جارێكی تر لە بەهارێكی تر و جێ‌یەكی تردا دەردەكەونەوە. واتە هەروەك یەك بە یەكی ئەوانە بەوپەڕی ڕوونی و ڕەوانی و بە شێوە و شكڵە ڕواڵەتی‌یەكەی، كارەكانی باب و باپیرانی پێشووی دەردەخات، بە هەمان جۆر و لە ڕێی بڵاو كردنەوەی پەلەكان و دەم كردنەوەی گەڵا و بەرەكانی، لاپەڕەی كردارەكانی خۆیشی بڵاو دەكاتەوە و دەیانخاتە ڕوو.

بەڵێ، ئەو كەسەی كە هەر لە بەرچاوی خۆماندا بەوپەڕی دانایی و، پارێزگاری و، پەروەردەكاری و، نەرمونیانی، ئەم كارە ئەنجام دەدات، هەر ئەویشە كە دەفەرموێ: **﴿وإذا الصُحُفُ نُشِرَت﴾**.

بۆ خۆت بەم چەشنە خاڵەكانی تریش قیاس بكە بۆ سەر ئەمە و، گەر توانا و هێزی هەڵێنجان(استنباط)یشت هەیە، ئەوا فەرموو بۆ خۆت هەڵبگۆزە.

وا بۆ یارمەتی‌دانت ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾یش باس دەکەین:

وشەی: "كُـوِّرَتْ " کە لەم ڕستەیەدا هەیە، واتـای: "پێچانـەوە" و "کـۆ کردنـەوە" دەگەیـەنێت و، نموونەیـەکی گەلـێ ڕوون و ئاشـکرایە. سـەرەڕای ئـەوەی کـە ئامـاژە بـۆ هاووێنەشی لە دنیادا، دەکات:

یەکەم: خوای گەورە پەردەکانی: نەبوون و، "ئەثـیر" و، ئاسمانی لەسەر گەوهەری ئەو "خۆر"ە لاداوە کە چەشنی چرا دنیـای ڕوونـاك کردووەتـەوە و لـە گەنجینـەی میـهرەبانیی خۆیەوە هێناویەتە ئەم دنیایە. جا هەرکات ئەم دنیایە کۆتایی پێ هات و دەرگاکـانی داخران، ئەوا خواوەند ئەو گەوهەرە بە بەرگەکانی خۆی دەپێچێتەوە و کۆی دەکاتەوە.

دووهـەم: "خـۆر" کـاری ئـەوەی پێ سـپێرراوە کـە بـەیانیان تیشـکی ڕوونـاکی بـڵاو بکاتەوە و، ئێوارانیش بیانپێچێتەوە و سەر لە نـوێ کۆیـان بکاتـەوە. بـەم چەشنە، شـەو و ڕۆژ کارەکانیان بە نۆرە لەسەر زەوی ڕادەپەڕێنن، ئنجا خۆر شمەك و کەرەسەکانی دەپێچێتەوە و سـەودا و مامەڵـەکانی کـەم دەکاتـەوە. یـان لەوانەیـە "مـانگ" تـا ڕادەیـەك پەردەیـەك بێـت بـۆ (وەرگرتن و بەخشینەکانی ئەو خۆرە). واتە هەروەك ئەم کارمەندە ئەرك پێ‌سپێرراوە لـە ڕێـی ئەم هۆیانەوە شمەکەکانی خۆی کۆ دەکاتەوە و دەفتەری تۆماری کارەکانی دەپێچێتەوە، دەبێ بـە هـەمان جۆریـش ڕۆژێـك بێتـە پێشـەوە کـە لـەکار بخرێـت و بـە تـەواوەتی ئـەرك و کارمەندی‌یەکانی ئەستۆی تـەواو ببن، بـا هیـچ هۆکـارێکیش بـۆ لەکارخسـتنی لـە ئـارادا نەبێت..

لەوانەیە ئەو دوو پەڵە بچووکەی کە گەردووناسان بە ڕووی خۆرەوە دەیبینن و بەرەبەرە لە فراوانبووندان، ئەوە دەربخەن کە: خۆر بە فەرمانی خوای گـەورە و لـە ڕێـی فراوان بوونـی ئەو دوو پەڵەیەوە وردە وردە ئەو ڕووناکی‌یەی خۆی کۆ بکاتەوە و بیپێچێتەوە کە بـە فـەرمانی خوای گەورە بەسەر زەوی‌دا بڵاوی کردبووەوە، ئنجا پەروەردگاری خاوەن عـیززەتیش پێـی بفەرموێ: "ئالێرەدا کاری تۆ لەگەڵ زەوی‌دا کۆتایی پێ‌هات.. هەر ئێستا ئامادە بە و بـڕۆ بۆ دۆزەخ ئەوانە بسـووتێنە کـە تۆیـان دەپەرست و، کارمـەندێکی گوێڕایـەڵ و ملکـەچی وەك تۆیان بە سووکی سەیر دەکرد و، تۆمەتی خیانەت و بێ‌وەفایی‌یان دەدایە پاڵ"!

بـەم جـۆرە "خـۆر" فـەرمانی پـەروەردگاریی: ﴿إِذَا الشَّـمْسُ كُـوِّرَتْ﴾ لەسـەر ڕووە پەڵاوی‌یەکەی خۆی دەخوێنێتەوە!

## پارچەی پێنجەمی

### پاشکۆی وتەی دەهەم

... سەد و بیست و چوار هەزار لە مرۆڤە هەڵبژاردەکانی گرۆی ئادەمیزاد کە پێغەمبەرانن -دروودی خوایان لەسەر بێت - (بەپێی دەقی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ)(١) کە هەندێکیان پشت بە "شهوود" دەبەستن و هەندێکی تریشیان لە روانگەی "حق الیقین"ەوە دەدوێن.. هەموو ئەوانە، بە گشتی و یەکدەنگ هەواڵی بوونی ڕۆژی قیامەتمان دەدەنێ و ڕایدەگەیەنن کە: سەرجەمی خەڵکی دەدرێنە بەر بۆ ئەو ڕۆژە و خوای باڵادەست هەروەك بەڵێنی داوە بە بێ گومانیش ڕۆژی دوایی دەهێنێتە کایەوە..

ئنجا ئەم مژدە و هەواڵەی کە ئەو پێغەمبەرە سەروەرانە - درووديان لەسەر بێت - ڕایانگەیاند، سەد و بیست و چوار ملیۆن ئەولیاش بە "کەشف" و "شهوەد" و "علم الیقین" دیویانە و ڕاستی‌یەکەیان دەرخستووە و شایەتی‌یان لەسەر داوە. ئەم شایەتیدانەشیان بەڵگەیەکی گومانبڕی بەهێزە لەسەر بوونی "ڕۆژی دوایی"..

هەروەها درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری گەردوون، کە بە سەرانسەی جیهانەوە دیار و درەخشانن، داخوازی بوونی جیهانێکی هەمیشەیین و بەڵگەیەکی ئاشکرای ڕۆژی دوایین..

بەڵگەیەکی تری ڕۆژی دوایی، ئەو "توانا ئەزەلی" و "دانستە ڕەها ئەبەدی"یەی خوای گەورەیە کە هەموو ساڵێك لە وەرزی بەهاردا بە فەرمانی: "کن.. فیکون" تەرمی ئەو درەختە لەژمارەبەدەرە وشك و مردووانەی سەر زەوی زیندوو دەکاتەوە و دەیکات بە نیشانە و بەڵگەی: "زیندووبوونەوەی پاش مردن" و، سێ‌سەد هەزار جۆر لە زیندەوەر و ڕووەك زیندوو دەکاتەوە و، بەمەش سەدان هەزار نموونەی حەشر و نەشر و بەڵگەی ئاخیرەتمان بۆ دەردەخات..

هەروەها ئەو "میهرەبانی"یە فراوانەی خوای گەورە کە درێژە بە ژیانی ئەو گیاندارانە دەدات پێویستیان بە ڕۆزی‌یە و بە کەماڵی میهرەبانی و بە شێوەیەکی تابڵێی دەراسا دەیانژیێنێت.. هەروەها ئەو "چاودێری"یە بەردەوامەی خواوەندیش کە لە ماوەیەکی کەم و وەختێکی کورتی وەك وەرزی بەهاردا چەندەها جۆری جوانی و ئارایشتکاریی لەژمارەبەدەری هەمەڕەنگمان پیشان

---

(١) عن أبي أمامة، قال أبو ذر: "قلت: يارسول الله كم وفاء عدة الأنبياء؟ قال: مائة ألف وأربعة وعشرون ألفاً، الرسل من ذلك ثلاثمائة وخمسة عشر جماً غفيراً". رواه الإمام أحمد (مشكاة المصابيح ١٢٢/٣ ت ٥٧٣٧ قال المحقق: حديث صحيح) وانظر زاد المعاد المحقق ٤٣/١. (وەرگێر)

دەدات. بێ گومـان ئـەم "میـهرەبانی" و "چـاودێری"یـەش بـە چەشـنێکی بەڵگەنەویسـت داخـوازی "بوونی ڕۆژی دوایی"ن..

هەروەها "ئەوینی مانەوە" و "تاسەی هەتاهەتایی" و "ئاواتە هەمیشەییەکان"یش کە ڕەگیـان لـە مرۆڤدا داکوتاوە و بە تەواوی جێی خۆیـان لـە نـاخی ئـەم مرۆڤـەدا کردووەتـەوە کـە: ڕێکوپێکـترین بـەروبوومی ئــەم بوونــەوەر و گـەردوونەیــە و خۆشەویســترین بەدیــهاتووی بەدیهێنەریــەتی و پەیوەندییەکی فراوانـی لەگـەڵ سـەرجەمی بوونـەوەرانی گـەردووندا هەیـە. بێ گومـان ئـەم تاسـە و ئەوین و ئاواتانە، ئاماژە بۆ بوونی جیهانێکی هەمیشەیی پاش ئەم جیهانە براوەیە دەکـەن و، بەڵگـەی بوونی ڕۆژی دوایی و خانەی بەختەوەریی هەمیشەیین.

هـەموو ئـەو بەڵگانـەی کـە بـاس کـران، تـا ڕادەی بـاوەڕ پێ کردن و بـە ئـەندازەی ئاشـکرایی و بەڵگەنەویسـتیی بوونـی ئـەم جیهانـە بیـنراوە، بوونـی "ڕۆژی دوایـی" دەچەسـپێنن و ئاشـــکرای دەکەن[1].

جـا مـادەم وانـەی "ئیمـان بە ڕۆژی دوایـی" گـرنگترین وانـەیە کـە قـورئانی پیرۆز بـە ئێمـەی دەڵێتەوە و، ئەم ئیمانەش بەم چەشنە و تـا ئـەم ڕادەیـە جێگیر و دامـەزراوە و، خـاوەنی بەڵگـەی ئـاوا بەرز و توندوتۆڵە و.. ئنجـا ئـەو نـوور و ئومێـد و دڵدانەوەیـەش کـە لـە ئیمـاندان هێنـدە بـەهێزن کـە ئەگـەر سـەد هـەزار "پیری" لـە یـەك کەسـدا کۆببنـەوە هـەر سـەروزیادی پێ بەخشـینی دڵنــەوایی و ڕووناك کـردنـەوەی هـەموویـان دەبێـت.. ئـەوا دەبێ ئێمـەی پـیری بەسـاڵاچـوو بـە پیرییەکەمـان دڵخۆش و شادمان بین و هەمیشە بڵێین:

"الحـــمد لله علی کمال الإیمان".

---

(١) ئاسانیی چەسپاندنی هەواڵێکی "ئیجابی" و دژواریی "نەفی" کردنیشی لەم نموونەیەوە دەردەکەوێت:

ئەگەر یەکێك وتی: (لە سەر زەویدا باخچەیەك هەیە بەروبوومـەکانی وەك قوتـووی شیر وایـە)! یـەکێکی تریـش لـە بەرپەرچیدا وتی: (شتی وا نییە)! ئەوا یەکەمیان دەتوانێت تەنها بە پیشاندانی جێی ئەو باخچەیە، یان بـە پیشـاندانی هەندێ لە بەروبوومەکەی، قسەکەی بە ئاسانی بچەسپێنێت.

بەڵام دووەمیان دەبێ هەموو سەرزەوی بگەڕێت و بیپشکنێت و بەمەش بیچەسپێنێت کە باخچەی وا نییە! (دیـارە ئەمەش کارێکی ئاسان نییە)..

هەروەها سەبارەت بەوانەش کە هەواڵی بوونی ڕۆژی دوایی و بەهەشتمان دەدەنـێ، هـەزاران بەڵگـە و بـەروبووم و ئەنجامی ئەو بەهەشتەمان پیشان دەدەن، لە کاتێکدا کە دوو شایەتی ڕاستگۆ سەروزیادە بۆ سەلماندنی قسەکەیان.

بەڵام ئەوانەی کە ئەمە ناسەلمێنن، دەبێ ئەم بوونەوەر و زەمانە یەکجار فراوانـە بپشـکنن و هـەموویان بگـەڕێن، ئـەوجا گەر بەهەشتیان نەدۆزییەوە، دەتوانن قسەکەیان بە بەڵگەوە بچەسپێنن!

جا برایانی پیرم! فەرموون سەیری گەورەیی هێزی "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" بکەن و، بزانن چـەندە پاڵپشـتێکی پتـەوی دامەزراوی توندوتۆڵە! (دانەر)

# وتەی یازدەهەم

بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿والشَّمسِ وضُحاها ۞ والْقَمَرِ إذا تَلاها ۞ والنّهارِ إذا جَلاّها ۞ والليلِ إذا يغشاها ۞ والسّماءِ وما بناها ۞ والأَرضِ وما طحاها ۞ ونفسٍ وما سوّاها﴾** (الشمس:١-٧)

برام! ئەگەر دەتەوێت شتێك لە نهێنییەكانی دانایی جیهان و، مەتەڵی بەدیهێنانی مرۆڤ و، هێماكانی ڕاستیی نوێژ تێبگەیت، ئەوا فەرموو لەگەڵ مندا سەرنج لەم چیرۆكە كورتە بدە:

لە سەردەمێكدا پادشایەك چەندین سامانی زۆر و گەنجینەی گەورە گەورەی هەبوو كە پڕ بوون لە جۆرەهای جۆری گەوهەر و ئەڵماس و زمڕووت، لەگەڵ چەندین گەنجینەی شارراوەی سەرسووڕهێنەرتری زۆر و زەبەندەدا. ئەم پادشایە تایبشلێیت زانا و ئاگاداری تەواوی زانستە ناوازە و لەژمارەبەدەرەكان بوو، هەروەك خاوەنی چەندین كارامەیی بێ وێنە و داهێنانكاری بوو لە سنعەتەكانیدا.

جا هەروەك هەموو "جوان" و "خاوەن كەماڵ"ێك حەز دەكات تەماشای جوانی و كەماڵی خۆی بكات و پیشانی غەیری خۆیشی بدات، ئەم پادشا مەزنەش بە هەمان جۆر بوو، ویستی پیشانگایەكی مەزن ساز بكات بۆ پیشاندانی بەدیهێنراوە پڕ لە وردەكارییەكانی، تاكو سەرنجی میللەتەكەی بۆ مەزنیی دەسەڵاتداری و سامانە زۆرەكەی خۆی ڕابكێشێت و، بەم كارەش هەندێ لە دروستكراوە ورد و نائاساییەكانی و لایەنە سەیر و سەرسووڕهێنەرەكانی ناسینی خۆی بۆ ئەوان دەربخات. هەموو ئەمانەش بۆ ئەوەی لە "دوو" ڕووەوە جوانی و كەماڵی مەعنەویی خۆی ببینێت:

**یەكەم:** بە چاوی وردبین و تیژی خۆی ئەو شتانە ببینێت كە لە پیشانگاكەیدا خستوونیەتە بەرچاو.

**دووهەم:** بە چاوی غەیری خۆیشی بیانبینێت.

لە پێناوی ئەم داناییەدا، پادشا كۆشكێكی تابلێی بەرز و مەزنی بنیات نا، پاشان بە لێزانانە ئەو كۆشكەی بە چەند مەنزڵ و فەرمانگەیەك دابەش كرد و، هەریەك لەو بەشانەشی بە

گەوهەرەکانی ناو گەنجینە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئارایشت دا و، بە جوانترین نیشانە و ئاسەواری داهێنانەکانی خۆی نەخشاندنی و، بە وردترینی جۆرەکانی هونەری زانایی و دانایی ڕێکیخستن و، بە جێدەستی پڕ لە ئیعجاز و نائاسایی کارەکانی خۆیشی ڕازاندنیەوە.

کە کۆشکەکەی تەواو کرد، چەندین سفرە و خوانی باش و جوانی تێدا ڕاخست کە هەموو چەشنە خواردەمەنی‌یەکی بەتام و باشترین نیعمەتە بەنرخەکانی لەسەر دانابوون و، بۆ هەموو تاقمێك ئەو جۆرە سفرە و خوانەی بە تایبەتی ڕازاندەوە کە شیاوی بێت، بەم جۆرە میوانداری‌یەکی گشتی و باشی ساز دا و، بەم کارەش سەخاوەتمەندی و داهێنان و دەست ڕەنگینی‌یەکی وای نواند کە پێشتر نەبینرابوو، بە ڕادەیەك کە هەریەك لەو سفرە و خوانانە لە سەدان جۆری وردەکاریی نەرمونیان و شوێنەواری سنعەتی ورد پڕ کرابوون، بەهۆی ئەو نیعمەتە بەنرخ و لەژمارەبەدەرانەی کە لە سەریان دانرابوون.

پاشان هەموو میللەت و دانیشتووانی وڵاتەکەی بۆ میوانداری و گەشت و سەیران و تەماشا کردنی پیشانگاکەی بانگ کرد و، گەورەی کار پێ سپێرراوان و نێرراوانی بەرێزی کۆشکەکەی خۆیشی لە هەموو دانایی‌یە بێ وێنە و لایەنە داهێنانکاری‌یەکان و واتا وردەکانی هەموو بەش و لایەکی کۆشکەکەی تێ گەیاند. بۆ ئەم کارەش مامۆستایەکی پێشەوا و ڕابەر و کارامەی بۆ میللەتەکەی دانا، تاکو مەزنیی ئەو کەسەی کۆشکەکەی بنیات ناوە و نەخش و نیگاری بێ وێنە و هاوسەنگی تێدا داناوە، بە خەڵکی بناسێنێت و، ئەوانەی دێنە ناویەوە شارەزای هێما و گەوهەرە هۆنراوە و ئاماژە وردەکانیان بکات و، مەودای ئەوەیان بۆ دەربخات کە تا چەندە ئەمانە دەبن بە بەڵگەی مەزنی و تەواوی و کارامەیی و وردەکاریی خاوەنی ئەو کۆشکە و، ڕێ و شوێنی چوونە ناو کۆشك و ڕەویە و چۆنێتیی هەڵسوکەوت و هاتوچۆ تیایدا، بەو جۆرەی کە مایەی ڕەزامەندیی پادشا بێت - کە لە پشتی پەردەوە نەبێ نابینرێت - بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە.

ئەم مامۆستا شارەزایە لە ناوەڕاستی قوتابی‌یەکانی و لە فراوانترین فەرمانگەی کۆشکەکەدا بوو، یارمەتی دەرانیشی لە فەرمانگەکانی تری کۆشکدا بڵاو بووبوونەوە.

ئەم مامۆستایە دەستی بە ڕێنمایی‌یەکانی کرد و، وتی:

(خەڵکینە! مەبەستی سەرداری ئێمە، کە خاوەنی ئەم کۆشکە بێ وێنە و فراوانەیە، لە بنیاتنانی ئەم کۆشکە و پیشاندانی ئەم ڕواڵەتانەی وان لە بەرچاوتاندا، ئەوەیە کە: "خۆی بە ئێوە بناسێنێت". کەواتە ئێوەش بیناسن و هەردەم بۆ باشتر ناسینی تێ‌بکۆشن..

بەم ئارایشتکاری‌یە جوانانەش دەیەوێت: "خۆی لای ئێوە خۆشەویست بکات". ئێوەش

به‌وه‌ی كار و سنعه‌ته‌كانی ئه‌وتان به‌لاوه جوان بێت و ڕێزی شایانی لێ بگرن، خۆتانی له لا خۆشه‌ویست بكه‌ن..

هه‌روه‌ها به‌و چاكه‌كاری و نیعمه‌تانه‌ی كه پێتانی ده‌به‌خشێت، ده‌یه‌وێت خۆی لای ئێوه خۆشه‌ویست بكات و خۆشه‌ویستیی خۆیتان پیشان بدات. ده‌سا ئێوه‌ش به‌وه‌ی كه به باشی گوێبیستی بن و فه‌رمانبه‌رداری فه‌رمانه‌كانی بن، ئه‌وتان خۆش بوێت.

به‌م ڕێزلێنان و نیعمه‌ت پێ به‌خشینه‌یش، ده‌یه‌وێت: "شه‌فه‌قه‌ت و میهره‌بانیی خۆیتان بۆ ده‌ربخات". ئێوه‌ش به‌رامبه‌ر به‌مه، شوكرانه و ڕێزلێنانی خۆتانی بۆ ده‌رببڕن..

ده‌یه‌وێت به ئاسه‌وار و شوێنه‌واره‌كانی كه‌مالی خۆی، كه له‌م به‌دیهێنراوه جوان و ته‌واوانه‌دا به ئاشكرا دیارن، "جوانی‌یه مه‌عنه‌وی‌یه‌كه‌ی خۆیتان بۆ ده‌ربخات". ئێوه‌ش شه‌وق و تاسه و ئاره‌زوومه‌ندیتان بۆ: بینین و به‌یه‌ك گه‌یشتن و ده‌ستخستنی ڕه‌زامه‌ندیی ئه‌و، ئاشكرا بكه‌ن.

ئه‌وه‌ی له ئێوه ده‌وێت كه بزانن: "هه‌ر ته‌نها ئه‌و تاكه ده‌سته‌لاتدار و فه‌رمانڕه‌وای سه‌ربه‌خۆیه"، به‌وه‌ی كه به چاوی خۆتان دروشم و مۆری ئه‌و ده‌بینن كه به‌سه‌ر هه‌موو به‌دیهێنراوانه‌وه‌ن و به كه‌س لاسایی ناكرێنه‌وه، چونكه هه‌موو شتێك هی ئه‌وه و تایبه‌ته به‌و پادشایه و له ده‌ستی توانستی ئه‌و ده‌رچووه. كه‌واته ده‌بێ باش بزانن كه جگه له‌و كه‌سی تر ده‌سته‌لاتدار و فه‌رمانڕه‌وا نی‌یه، چونكه هه‌ر ئه‌و پادشای ده‌سته‌لاتداری تاك و ته‌نیای بێ وێنه و بێ هاوتایه).

ئه‌م مامۆستا مه‌زنه به‌م چه‌شنه گوفتاره شیرینانه‌ی كه شایانی پله و شان و شكۆ و مه‌زنی و چاكه‌كاریی پادشان، له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌دا ده‌دوا كه ده‌هاتنه ناو كۆشكه‌كه و سه‌یریان ده‌كرد.

پاشان ئه‌وانه‌ی كه هاتنه ناو كۆشكه‌كه بوون به دوو ده‌سته‌وه:

**ده‌سته‌ی یه‌كه‌م:**

ئه‌م ده‌سته‌یه ئه‌وانه بوون كه خاوه‌نی ژیریی ڕوون و دڵ و ده‌روونی دڵنیا و ساف و بێگه‌رد بوون و، ڕێزی خۆیانیان ده‌زانی. ئه‌مانه كه له ئاسۆكانی هه‌ر شوێنێكی ئه‌م كۆشكه مه‌زنه‌دا ده‌گه‌ڕان و چاویان ده‌گێڕا و ته‌ماشای لایه‌نه سه‌رسووڕهێنه‌ره‌كانیان ده‌كرد، ده‌یانوت: ده‌بێ ئه‌مه كارێكی گه‌وره و گرنگی تێدا بێ و ئامانج و مه‌به‌ستی به‌رزی له پشته‌وه بێت! به‌م جۆره تێ گه‌یشتن له‌وه‌ی كه هیچ بێ‌مه‌به‌ستی و، یاری و، گاڵته و گه‌پێكی منالانه له‌م كارانه‌دا نی‌یه، بۆیه له سه‌رسووڕماندا ده‌یانوت:

ئایا دەبێ مەتەڵی ئەم کۆشکە بە چی حەل ببێت و، چ داناییەك لەم شتانەدا هەیە کە بینیمانن و دەیانبینین؟!

لەم کاتەدا کە ئەمان لەم بارەیەوە دەدوان و بیریان لێ دەکردەوە، دەنگی گوفتار و وتاری مامۆستا شارەزا و لێزانەکەیان بیست و ڕوونکردنەوە جوانەکانی ئەویان بەر گوێ کەوت. بەمە بۆیان دەرکەوت کە کلیلی هەموو نهێنی و کردنەوەی هەموو گرێ کوێرەیەکی لە لایە، لەبەر ئەوە بە هەڵەداوان خۆیان گەیاندە لای و، وتیان:

سـڵاو ئـەی مامۆستای بەڕێز! کۆشکێکی ئاوا بەرز و بڵند پێویستی بـە پێناسـەرێکی ڕاستگۆ و وردکار و دەستپاکی وەك تۆیە، تکات لێ دەکەین هەندێکمان لەو شتانە فێر بکە کە سەرداری مەزنمان فێری کردوویت.

مامۆستاکەش ئەو گوفتار و وتارەی بۆ وتن کە باسمان کرد. ئەوانیش بەوپەڕی ئەدەب و ڕێزەوە گوێیان لێ ڕاگرت و بە ڕەزامەندی و دڵنیـایی تـەواو گـوفتارەکانی ئـەویان وەرگرت و، بەمەش سوودێکی گەلێ زۆریان دەست کەوت. چونکە دوای ئەمە بـەپێی ڕەزامەندییەکانی پادشاکەیان ڕەفتاریان دەکرد. پادشـایش کـە ئـەم شـادی و دڵخۆشییەی ئەوانی سەبارەت بە فەرمانەکانی خۆی لێ بینین، لێ ڕازی بوونی خۆی بۆ نواندن و، بۆ کۆشکێکی مەزنتر و بەرزتری ئەوتۆی بانگ کردن کە لەباسکردن نایەت، لەوێ ڕێزی زۆری لێ نان و بەختەوەرییەکی پێ بەخشین کە لەگەڵ شان و شکۆی موڵکدارێکی دەست ڕەنگین و سەخاوەتمەندیی پادشایەکی وەك ئەودا گونجاو بێت و، بۆ ئەو میوانە بەڕێز و خاوەن ئەدەبانە بشێت و، شایانی ئەو گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارانەی فەرمانەکانی خۆی بێت.

**بەڵام دەستەکەی تر:**

ئەوانە بوون کە هەروەك ژیرییان گەنیبوو، پشکۆی دڵیشیان تروسکایی لێ بڕابوو. ئەمانە هەر ئەوەندەی ڕۆشتنە ناو کۆشکەکەوە، ئارەزووەکانی دەروونیان بەسەردا زاڵ بوو. ئیتر جگە لەو خواردەمەنییە خۆشانەی حەزیان لێی بوو، ئاوڕیان لە شتی تر نەدایەوە و تەماشای هیچ کام لەو جوانییانەیان نەکرد و گوێی خۆیان لەو هەموو ڕێنمایی و ئامۆژگارییانەی ئەو مامۆستا مەزنە و قوتابییانی ئەو، ئاخنی و، ئاژەڵ ئاسا بە چڵێسی و بێ شەرمی تەپیان دایە سەر خواردەمەنییەکان، لە ئەنجامی ئەمەشەوە بێئاگایی و مەستی و خەو بەسەریاندا زاڵ بوون. ئەوەندەش زیادەخۆرییان لەو جۆرە خواردن و خواردنەوانەدا کردبوو کە مۆڵەتی خواردنەوەیان نەدرابوون، تا وایان لێ هات دەستیان بە غەڵبەغەڵب و کاری هێندە شێتانە کرد کە حەوانەوە و سرەوتیان لە میوانەکانی تر سەند و بێزاریان کردن.

له‌به‌ر ئه‌وه‌، سه‌ربازانی پادشا ئه‌مانه‌یان گرت و به‌ره‌و به‌ندیخانه‌یه‌كی سامناكیان بردن، تاكو له‌وێ له‌ تۆڵه‌ی ئه‌و بێ شه‌رمی‌یانه‌ی نواندیان، سزای ڕه‌وای خۆیان بدرێن.

ئه‌ی ئه‌و كه‌سه‌ی له‌گه‌ڵ مندا گوێ له‌م چیرۆكه‌ ڕاده‌گرێت!

ده‌بێ له‌وه‌ تێ گه‌یشتبیت كه‌ ئه‌و پادشایه‌ ئه‌م كۆشكه‌ی له‌ پێناوی ئه‌و مه‌به‌سته‌ باسكراوانه‌دا دروست كرد.. هاتنه‌دیی ئه‌و ئامانج و مه‌به‌ستانه‌ش پشت به‌ دوو شت ده‌به‌ستن:

**یه‌كێكیان:** بوونی ئه‌و مامۆستایه‌ی كه‌ بینیمان و گوێمان له‌ وتاره‌كه‌ی ڕاگرت. چونكه‌ ئه‌گه‌ر ئه‌و مامۆستایه‌ نه‌بێت، هه‌موو ئه‌و مه‌به‌ستانه‌ی پادشا بێ سوود و كه‌ڵك ده‌مێننه‌وه‌ و، وه‌ك كتێبێكیان لێ دێت كه‌ واتاكانی نه‌زانرێن و مامۆستایه‌كیش نه‌بێت ڕوونیان بكاته‌وه‌. كه‌واته‌ ئه‌و چه‌شنه‌ كتێبه‌ بریتی ده‌بن له‌ چه‌ند په‌ڕه‌یه‌كی بێ واتا و ناوه‌رۆك!

**دووهه‌میان:** گوێڕاگرتنی خه‌ڵكی‌یه‌ له‌و مامۆستایه‌ و، وه‌رگرتنی گوفتاره‌كانیه‌تی و ڕه‌فتار كردنه‌ به‌ ڕێنمایی‌یه‌كانی.

واته‌: بوونی مامۆستاكه‌ هۆیه‌ بۆ بوونی كۆشكه‌كه‌ و، گوێڕاگرتنی خه‌ڵكیش له‌و مامۆستایه‌ هۆی مانه‌وه‌ و به‌رده‌وامیی ئه‌و كۆشكه‌یه‌.. له‌به‌ر ئه‌وه‌، ده‌توانرێت بوترێت: (گه‌ر ئه‌م مامۆستایه‌ نه‌بوایه‌، پادشای مه‌زنیش ئه‌م كۆشكه‌ی دروست نه‌ده‌كرد). هه‌روه‌ها ده‌توانرێت بوترێت: (كاتێ خه‌ڵكی وایان لێ بێت گوێ له‌و مامۆستایه‌ ڕانه‌گرن و بایه‌خ به‌ گوفتاره‌كانی ئه‌و نه‌ده‌ن، ئه‌وا پادشایش ئه‌م كۆشكه‌ ده‌گۆڕێت و هی تر له‌ جێیدا بنیات ده‌نێت).

* * *

هاوڕێی به‌ڕێزم! لێره‌دا چیرۆكه‌كه‌ دوایی هات. جا ئه‌گه‌ر له‌ نهێنی‌یه‌كه‌ی تێ گه‌یشتوویت، ئه‌وا فه‌رموو له‌ دوو توێی ئه‌م چیرۆكه‌وه‌ سه‌یری ڕووی "ڕاستی" بكه‌:

ئه‌و كۆشكه‌، ئه‌م جیهانه‌یه‌ كه‌ به‌م ئاسمانه‌ گه‌ش و ئه‌ستێره‌ دره‌خشان و ڕازاوانه‌ سه‌ری گیراوه‌ و، ئه‌م زه‌وی‌یه‌شی بۆ كراوه‌ به‌ ڕایه‌خ كه‌ له‌ خۆرهه‌ڵاته‌وه‌ بۆ خۆرئاوا ڕۆژ به‌ ڕۆژ به‌ گوڵزاری نوێ ئارایشت ده‌درێت.

ئه‌و پادشایه‌ش، خواوه‌ندی گه‌وره‌ و پادشای ئه‌زه‌ل و ئه‌به‌د و خاوێن و شكۆمه‌ند و خاوه‌ن كه‌ره‌می ئه‌وتۆیه‌ كه‌: "هه‌ر حه‌وت ئاسمانه‌كان و زه‌وی و هه‌رشتێكیان تێدایه‌، ته‌سبیحاتی ده‌كه‌ن"[1] چونكه‌ "هه‌ریه‌ك له‌وانه‌ نوێژ و ته‌سبیحاتی خۆی ده‌زانێت"[2].

---

(١) ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّموَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ﴾(الإسراء:٤٤).
(٢) ﴿.. كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ﴾(النور:٤٨).

خواوەند ئەو خاوەن دەستەڵاتەیە کە: "ئاسمانەکان و زەویی لە شەش ڕۆژدا دروست کرد و پاشان بە سەر عەرشدا زاڵ بوو و، بە (شەو) (ڕۆژ) دادەپۆشێت و وای لێ دەکات بە هەڵەداوان بە دوای ڕۆژدا بڕوات و، مانگ و خۆر و ئەستێرەکان گوێڕایەڵی فەرمانی ئەون"[1].

مەنزڵگاکانی ئەو کۆشکەش، هەژدە هەزار جیهانی ئەوتۆن کە هەریەکەیان بەو بوونەوەرانەی لەگەڵیدا بگونجێن و شایانی بن، ڕێك خراوە و ئارایشت دراوە.

سنعەتە سەرسووڕهێنەکانی ناو کۆشکەکەش، موعجیزاتی توانستی خواوەندن کە لەم جیهانەدا بۆ هەموو کەسێکی خاوەن بینایی و بەسیرەت، ئاشکرا و لە بەرچاون.

ئەو خواردەمەنی‌یە بەتام و لەزەتانەش کە تیای‌دا دەیانبینیت، نیشانەکانی میهرەبانیی خواوەندن، لەو بەروبووم و میوە بێ وێنانەی کە بە ئاشکرا لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا بە تایبەت لە هاوین و بە تایبەتیش لە ڕەز و باخەکانی "بارلا "دا[2] دەبینرێن.

جێی کوڵاندن و پێ‌گەیاندنی خۆراکی ئەو کۆشکەیش، ڕووی زەوی و ناوەوەیەتی کە یەك پارچە ئاگرە و داگیرساوە.

ئەو گەوهەرانەی ناو گەنجینە شارراوەکانیش کە لە چیرۆکەکەدا بینیتن، لە ڕاستی‌دا چەند نموونەیەکی درەوشانەوەکانی ناوە پیرۆز و خاوێن و جوانەکانی خواوەندن.

ئەو نەخش ونیگارانە و هێماکانیان کە بینیمان، ئەم بوونەوەرە ئارایشت دراوانەی جیهانن، کە چەند نەخشێکی هاوسەنگن و بە قەڵەمی توانستی خوای گەورە کێشراون و بەڵگەن لەسەر ناوەکانی خواوەندی بەتوانای شکۆمەند.

ئەو مامۆستایەش، سەردارمان و سەرداری هەموو جیهان حەزرەتی محەممەدە ﷺ و، یاریدەدەرانیشی پێغەمبەرانن (درووديان لەسەر بێت) و، قوتابییانیشی ئەولیا و پیاوچاکان و، زانا دەروون خاوێنەکانن.

خزمەتگوزارانی پادشای مەزنیش، ئاماژەیە بۆ مەلائیکەتانی خواوەند لەم جیهانەدا.

هەموو ئەوانەش کە بۆ ئەم میوانخانەیەی دنیا بانگ کراون، ئاماژەن بۆ گرۆی "جیننی و ئادەمیزاد" و، ئەو ئاژەڵ و زیندەوەرانەش کە خزمەتی مرۆڤ دەکەن.

دوو دەستە و تاقمەکەش:

---

(١) ﴿الَّذي خَلَقَ السَّمَوات وَالأَرْضَ في سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوى على الْعَرْشِ يُغْشي اللَّيْلَ النَّهارَ يَطْلُبُهُ حَثيثاً والشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرات بِأَمْرِهِ﴾(الأعراف:٥٤)

(٢) بارلا: گوندێکی دوورە لە باشووری خۆرئاوای تورکیا. مامۆستا نوورسی هەشت ساڵ و نیوی تێدا بە ڕەهەندەیی و دەست بەسەری، بەسەر بردووە. (وەرگێر)

**یه‌كه‌میان:** ئیماندارانن، كه‌ وانه‌كانیان له‌سه‌ر سفره‌ و خوانی ئه‌و قورئانه‌ پیرۆزه‌ ده‌خوێنن، كه‌ ته‌فسیری ئایه‌ته‌كانی كتێبی گه‌وره‌ی گه‌ردوون ده‌كات.

**ئه‌وی تر:** كافر و سته‌مكاران و كه‌ڕ و لاڵ و ڕێ لێ ون بوانن، كه‌ شوێن شه‌یتان و ئاره‌زووه‌كانیان كه‌وتوون و، جگه‌ له‌ ڕواڵه‌تی ژیان هیچی تر له‌ ژیان فێر نه‌بوون و، به‌ وێنه‌ی ئاژه‌ڵ ته‌نانه‌ت خراپتریشن.

ده‌سته‌ و تاقمی یه‌كه‌م، چاكه‌كار و به‌خته‌وه‌رانن. ئه‌وه‌بوو گوێیان له‌و مامۆستا مه‌زنه‌ ڕاگرت كه‌ دارای دوو "ڕاستی"یه‌، چونكه‌ "به‌نده‌"یه‌ و "پێغه‌مبه‌ر"یشه‌. له‌و ڕووه‌وه‌ كه‌ به‌نده‌یه‌، په‌روه‌ردگار به‌ خه‌ڵكی ده‌ناسێنێت و، هه‌موو وه‌سفه‌كانی شكۆمه‌ندی كه‌ شیاوی ئه‌و بن بۆ خواوه‌ندیان بڕیار ده‌دات. كه‌واته‌ ئه‌و له‌م ڕووه‌وه‌ وه‌ك نوێنه‌رێكی نه‌ته‌وه‌كه‌ی وایه‌ له‌ به‌رده‌م باره‌گای به‌رز و پیرۆزی خوای گه‌وره‌دا.. له‌و ڕووه‌شه‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر و فرستاده‌ی خوایه‌، ده‌یبینیت له‌ ڕێی ڕاگه‌یاندنی قورئانی پیرۆزه‌وه‌، فه‌رمانه‌كانی په‌روه‌ردگار به‌ هه‌موو گرۆی "جیننی و ئاده‌میزاد" ڕاده‌گه‌یه‌نێت.

ئه‌م كۆمه‌ڵه‌ به‌خته‌وه‌ره‌ دوای ئه‌وه‌ی كه‌ گوێیان له‌و پێغه‌مبه‌ره‌ به‌ڕێزه‌ ﷺ ڕاگرت و ملیان بۆ فه‌رمانه‌كانی قورئانی پیرۆزی "دانا" كه‌چ كرد، دوای ئه‌مه‌، چه‌ند كارێكی به‌تام و خۆشیان پێ سپێررا، كه‌ به‌ جۆرێك بوون پله‌ له‌ دوای پله‌ پایه‌ و مه‌قامی ئه‌مانی بڵند و به‌رز ده‌كرده‌وه‌. ئه‌و كارانه‌ش جێبه‌جێ كردنی "نوێژ"ه‌ كه‌ پوخته‌ و پێڕستی هه‌موو جۆره‌كانی خواپه‌رستی‌یه‌.

به‌ڵێ، ئه‌وانه‌ به‌ ئاشكرا هه‌رچی په‌یوه‌ندیی به‌ فه‌رزی نوێژه‌وه‌ ببێت، به‌ درێژی بینی‌یان و، به‌ پله‌ و پایه‌ به‌رزه‌كانی‌دا سه‌ركه‌وتن، ئه‌و پله‌ و پایانه‌ی كه‌ زیكر و جموجووڵه‌كانی نوێژ ئاماژه‌یان بۆ ده‌كه‌ن، كه‌ به‌ كورتی به‌م جۆره‌یه‌:

**یه‌كه‌م:** به‌وه‌ی كه‌ سه‌یری ئاسه‌واره‌ په‌روه‌ردگاری‌یه‌ په‌رش و بڵاوه‌كانی ناو گه‌ردوونیان كرد، خۆیان له‌ پله‌ی سه‌یركه‌رانی جوانی‌یه‌كانی مه‌زنیی په‌روه‌ردگارێتیی خوادا بینی "به‌ مامه‌ڵه‌یه‌كی نادیار"[1]، ئیتر له‌ به‌رامبه‌ر ئه‌مه‌وه‌ فه‌رمانبه‌ریی ته‌كبیر و ته‌سبیحیان به‌ وتنی: "الله اكبر" ئه‌نجام دا.

(١) واته‌: هه‌رچه‌نده‌ خوای گه‌وره‌ نابینن و لێیان دیار نی‌یه‌. به‌ڵام ئه‌م ئاسه‌وارانه‌ی ده‌ستی په‌نهانی ئه‌و ده‌بینن و هه‌ستی پێ‌ده‌كه‌ن. (وه‌رگێڕ)

**دووهــەم:** بـەوەیش کـە لـە پلـەی بانگـەوازکار و ڕێپیشـاندەردا بـۆ داهێنانکاری‌یـەکانی سنعەتی خواوەند و ئاسەوارە ڕوونەکانی - کە درەوشانەوەی نـاوە جوانـەکانی خـواوەنـدن - دەرکـەوتن، بـەم کارەیـان و بـە وتنـی "سـبحان اللّٰه" و "الحمـد للّٰه" فەرمانبـەریی تـەقدیس و تەحمیدیان بەجێ هێنا.

**سـێهەم:** لـە پلـەی پـەی بردنـدا بـە نیعمـەت و بەخشایشـە پاشـەکەوت کراوەکـانی نـاو گەنجینەکانی میهرەبانیی خواوەند و، لەزەت بردنیان لەو نیعمەتانـە لـە ڕێـی هەستە ئاشکرا و پەنهانـەکانیان، لـەم پلەیــەدا، دەسـتیان بــە ئــەنجامدانی فەرمانبــەریی سوپاســگوزاری و شوکرانەبژێری کرد.

**چوارەم:** لە پلەی گەوهەرشناسیی گەنجینەی ناوە جوانەکانی خوای گـەورە و ڕێزلێنـانی شایانیان لەو ناوانە، بە پێی تـەرازووی ئەو کۆئەندامـە مەعنەوی‌یانـەی لـەواندا دانـراون، لـەم پلەیەشـدا دەسـتیان کـرد بـە جێ‌بـەجێ‌کردنی فەرمانبـەریی سـتایش و خــاوێن ڕاگرتنـی بیروباوەڕیان بەرامبەر بە خواوەند.

**پێنجەم:** لە پلەی خوێندنەوەی ئەو نامە پەروەردگاری‌یانەی کە بە قەڵەمی توانستی خـوای گـەورە لەســەر لاپـەڕەی قـەدەردا نووســراون، دەسـتیان بـە ئەنجامــدانی فەرمانبــەریی "بیرکردنەوە و بە جوان زانین و سەرسووڕمان" کرد.

**شەشـەم:** لـە پلـەی "پاك ڕوانینـدا بۆ خواوەنـد" سـەرنجی لەزەت‌بـەخش و بـەتامیان لـە وردەکاریی لوتفی خواوەند و ئـەو جوانی‌یـە نەرمونیانـە دەدا کـە لـە بەدیهێنان و ڕێکخستنی شتاندا هەن. بەم سـەرنج دانەشیان فەرمانبـەریی: تاسـەمەندی و خۆشەویستیی دروستکەری خاوەنی جوانی و بەدیهێنەری شکۆمەندیان جێ‌بەجێ کرد.

بەم جۆرە، دوای بەجێهێنان و ئەنجامدانی ئەم ئەرك و فەرمانبەری‌یانە لەو پلە و پایانەدا کـە باس کران و، دوای پەرستنی خواوەند بە چەشـنێکی نادیـار (کـە لێیانـەوە دیـار نی‌یـە)، دوای ئەمە و سەرەڕای ئەو دیارنەبوونـەش، ئـەمان بـەهۆی سـەیر کردنـی بوونەوەرانـەوە، بـەرەو ئـەو پلەیە ڕۆشتن و بەرزبوونەوە کە تەماشای مامەڵە لەگەڵ کردن و بینینی بەدیهێنەری دانای لـێ بکـەن و وەك ئــەوەی ڕووبــەڕوو ئامــادەی حــوزوور بــن ئــاوا لەگــەڵ کاروبارەکــانی ئــەو خواوەندەدا ڕەفتار بکەن، چونکە:

پێش هـەموو شـتێك: بەرامبـەر بـەوەی کـە بەدیهێنـەری مـەزن، لــە ڕێـی موعجـیزاتی دروستکراوانیەوە، لـە لای خـاوەن هەستان خۆی دەناسێنێت، ئـەمان لـە بەرامبـەر ئەمــەوە، ناسینێکیان بۆ خواوەند نواند کە پڕ بوو لـە سەرسووڕمان و، دەیانوت: "سـبحانك مـا عرفنـاك حق معرفتك". واتە:

(ئـه‌ی ئـه‌و خواوه‌نـده‌ی كـه لـه ڕێـی موعجـیزاتی هـه‌موو به‌دیهێنراوانتـه‌وه لای ئێمـه ناسراویت! تۆ گه‌لـێ به‌رز و پیرۆز و خاوێنی و، هێشتا بـه تـه‌واوی و بـه‌پێی پلـه‌ی شایانی ناسینت، ئێمه نه‌مان ناسیویت).

پاشان پێشـوازی‌یان لـه‌و كـاره‌ی خواوه‌نـدی میـهره‌بان كـرد كـه: بـه به‌روبوومـه‌كانی میهره‌بانی‌یه‌كـه‌ی، خـۆی لای ئـه‌وان خۆشـه‌ویسـت ده‌كـات، بـه‌وه‌ی كـه ئـه‌مانیش خۆشه‌ویستی و ئه‌وینی خۆیان بۆ ده‌ربڕی و هه‌موو به یه‌ك ده‌م وتیان: ﴿**إيّاك نعبـــد وإيّـــاك نستعين**﴾.

پاشـان بـه‌ده‌م میـهره‌بانیی ئـه‌و نیعمـه‌ت به‌خشـه ڕاسته‌قینه‌وه ڕۆشـتن كـه بـه نیعمه‌تـه پیرۆزه‌كانی و ده‌رخستنی میهره‌بانیی خۆی بۆیـان، بـه‌زه‌یی پێیـاندا دێتـه‌وه، بـه‌وه‌ی كـه ئـه‌مان سوپاسگوزاری و شوكرانه‌بژێری‌یان كرد و وتیان:

(ئـه‌ی ئـه‌و خواوه‌نـده‌ی كـه بـه چـه‌ندین زمـانی ڕه‌وانـی "حـاڵ"ی ئـه‌وتۆ كـه گشـت چاكه‌كاری‌یـه‌كانت لـه گــه‌ردووندا ده‌رده‌بــڕن، شـوكرانه‌بژێری ده‌كرێــت و، هــه‌موو به‌خششه‌كانت كه له بازاڕی جیـهان و ڕووی زه‌وی‌دا په‌رش و بڵاون، سوپاس و ستایشـت ڕاده‌گه‌یـه‌نن، ئـه‌وه‌تا هــه‌موو به‌روبوومــه ڕیزكراوه‌كـانی میــهره‌بانیی فـراوان و گشــت خوارده‌مه‌نی‌یـه ڕێك‌كراوه‌كـانی نیعمه‌تـه زۆر و گشـتی‌یه‌كانت، شـوكرانه‌بژێریی خۆیــان هه‌میشـه بـه‌وه پێشـكه‌ش ده‌كـه‌ن كـه لـه بـه‌رچاوی بوونـه‌وه‌راندا شـایه‌تی لـه‌سـه‌ر ده‌سـت ڕه‌نگینی و سه‌خاوه‌تمه‌ندیت ده‌ده‌ن.. ده‌سا ئه‌ی ئه‌و خواوه‌نده! ئێمه هێشتا به ته‌واوی و بـه‌پێی پله‌ی ڕاسته‌قینه‌ی شوكرانه كردنت نه‌مان توانیوه سوپاسگوزاری و شوكرانه‌بژێریی شـایانت به‌رامبه‌ر ده‌ربڕین).

پاشان له به‌رامبه‌ر دره‌وشانه‌وه و ده‌ركه‌وتنی مه‌زنیی جوانـی و شـكۆداری و كـه‌ماڵی ئـه‌و خـواوه‌نده‌وه له ئاوێنه‌ی بوونه‌وه‌ره بگـۆڕه‌كانی ڕووی گـــه‌ردووندا، ئـه‌مان "الله أكبر"یـان وت و، بـه كۆڵه‌واری‌یـه‌كی شـه‌رمه‌زارانه‌ی ڕێزلێنانی خواوه‌نـد، ڕكووعیـان بـۆ بـرد و، بـه خۆشه‌ویسـتی‌یه‌كی ئاوێتـه‌ی ملكـه‌چی و توانـه‌وه لـه خۆشه‌ویسـتیی خـوادا و لـــه نێــوان سه‌رسووڕمان و ڕێزلێناندا، سه‌ری سوژده‌یان بۆ ئه‌و خواوه‌نده مه‌زنه دانه‌واند.

پاشـان كـه بینی‌یـان ئـه‌و خواوه‌نـده خـاوه‌ن ده‌وڵه‌مه‌ندی‌یـه ڕه‌هایـه، سـامانه نـه‌بڕاوه و میهره‌بانی‌یه فراوانه‌كه‌ی خۆی ده‌رده‌خـات، ئه‌مانیش به‌ده‌م ئه‌م ده‌رخستنه‌وه ڕۆشـتن و، لـه ڕێی ده‌ربڕینی هه‌ژاری و نه‌داریی خۆیان لـه بـه‌رده‌م ئه‌و خواوه‌نـده‌دا ده‌سـتیان بـه پاڕانـه‌وه و نزای به‌كوڵ كرد و، ده‌یانوت: ﴿**إيّاك نستعين**﴾.

پاشـان سـەبارەت بـەوەی کـە ئـەو بەدیهێنـەرە مـەزن و شـکۆمەندە، وردەکاریـیـەکانی سنعەت و جوانکارییەکانی داهێنانە بێ وێنەکانی خۆی لە بەرچاوی خەڵکیدا و لە چەندین پیشانگادا دەردەخات، ئەمان پێشوازییان لەم کارە کرد و وتیان: "ماشاء الله، تبـارك الله" و، کە تەماشای ئەو پیشانگایانەیان دەکرد بـە لایانـەوە گەلـێ جوان دەبوون و پـر بـە دەم دەیـان وت: (خەڵکینە! وەرن سەیری ئەم داهێنانە ناوازانە بکەن.. وەرن بـۆ دەستکەوت و سوودی باش و بەکەڵك و بیانکەن بە شایەت لەسەر "بوون" و "یەکتایی" خواوەنـد و، ئێوەش شـایەت بن لەسەریان).

پاشـان بە وتنی: "سمعنا وأطعنا" و دەربڕینـی ملکەچـی و گـوێڕایەڵی کـردنیان، بـەدەم ڕاگەیاندنی ئەو پادشا مەزنەی ئەزەل و ئەبەدەوە ڕۆشتن، کە پـەروەردگارێتیی دەستەڵاتداریی خۆی بەسـەر هـەموو گـەردووندا ڕادەگەیـەنێت و "یـەکتایی" خـۆی بـۆ هـەموو بوونـەوەران ئاشکرا دەکات.

پاشان لە بەرامبەر ئەوەیشەوە کە پەروەردگاری هەموو جیهانیان خوایـەتیی مـەزنی خـۆی دەردەخات، ئەمان پوختە پەرستشێکیان ئەنجام دا کـە لاوازیـی نێـوان کۆڵـەواری و هـەژاریی نێوان دەستکورتییان دەردەخات، ئەو پوختە پەرستشەش "نوێژ"ە.

بەم پێیە و، بـەم چەشـنە فەرمانبەرییـە جۆراوجۆرانـەی بەندایـەتی، ئـەرکی ئەسـتۆی تەمەن و فەرزی گرنگی ژیانیان لـەم مزگەوتە هەرە مەزنـەدا کـە نـاوی دنیایـە، بـەجێ هێنـا، بـە ڕادەیـەك کـە شـێوەی: "جوانـترین بەدیـهێنراوی بـەنرخ و بـەهای گـەردوون"یـان وەرگـرت و پلەیەکیان دەست کەوت کـە لـە هـی هـەموو بوونـەوەران بـەرزتر بێـت، چونکـە بـەهۆی ئـەو ئیمان و ئەمانەتەی خوای گەورە پێی سپاردوون، بوون بە: جێنشین و ئەمینداری خواوەند لە زەویدا.

دوای تەواوبوونی ماوەی تاقیکردنـەوە و، دەربـازبوون لـە ئیمتیحـانی دنیـا، پـەروەردگارە بەخشندە و دەسـت ڕەنگینەکـەیان لـە پاداشتی ئیمانەکـەیاندا بـۆ بەختـەوەریی هەمیشـەیی و نیعمەتی بەردەوام بانگیان دەکات و، لە پاداشـتی ئیسلامەتییەکەشیاندا هـەروەك ڕێـزی لـێ ناون، ڕێزی زیاتریان بە چەندین نیعمەتی وا لـێ دەگرێت کە هیـچ چاوێك نـەیبینیون و، هیـچ گوێیەك باسی نەبیستوون و، بە دڵی هیچ مرۆڤێکیشدا نەهاتوون!

چونکـە بینـەری تاسـەمەندی جوانیـی هەمیشـەیی و ئـەو شـەیدایەی کـە وەك ئاوێنـە ئـەو جوانییەی تێدا دەردەکەوێت، دەبێ "باقی" بێـت و بەرەو "ئەبەد"یش بڕوات!

ئەمە پاشەڕۆژ و ئەنجامی قوتابییانی قورئانە. (اللهم اجعلنا منهم).

به‌ڵام كۆمه‌ڵه‌كه‌ی تر، كه ده‌سته‌ی خراپكارانن، هه‌ر هێنده‌ی به گه‌یشتنیان بۆ ته‌مه‌نی باڵغ بـوون، هاتنـه نـاو كۆشـكی ئـه‌م جیهانـه‌وه، لـه به‌رامبـه‌ر سـه‌رجه‌می به‌ڵگـه‌كانی "یـه‌كتایی" خواوه‌نده‌وه و له ئاستی ئه‌و نیعمه‌تانـه‌ی پێیـان درابوو، ده‌ستیان دایه كوفر و ناشكوری و، سه‌رانسـه‌ری بوونـه‌وه‌رانیان بـه "بـێ‌نرخی" تاوانبـار كـرد و، بـه چـاوی عه‌به‌سـییه‌ت و بێهووده‌یی بۆیان ڕوانی و، به‌م كاره‌ش نرخیان داگرته خواره‌وه و، دانیان به دره‌وشانه‌وه‌ی ناوه جوانه‌كانی خوای گه‌وره‌دا نه‌نا كه به ڕووی سه‌رجه‌می بوونه‌وه‌رانـه‌وه ده‌دره‌وشێنه‌وه، به‌م كاره‌شیان و له ماوه‌یه‌كی كورت و كـه‌م خایه‌ندا تـاوانێكی گـه‌وره‌یان ئه‌نجام دا. له‌سـه‌ر ئه‌مه‌ش بوون به شایان و شایسته‌ی سزا و ئازارێكی هه‌میشه‌یی.

به‌ڵێ، سه‌رمایه‌ی ته‌مه‌ن و جۆره‌ها كۆئه‌ندامی مرۆڤانه‌ی به‌رز ته‌نها له‌به‌ر ئه‌وه به مرۆڤ به‌خشراون، كه چه‌ندین فه‌رمانبه‌ریی به‌رز و بڵندیان پێ ئه‌نجام بدات.

ئه‌ی ده‌روونـی سه‌رسـارمی خـۆم و، ئـه‌ی ئـه‌و هاوڕێیه‌شـم كـه شـه‌یدای هـه‌وه‌س و ئاره‌زووه‌كانی خۆیه‌تی!

ئایـا وا ده‌زانـن "ئـه‌ركی گرنگـی ژیانتـان" ته‌نـها له‌وه‌دایـه داخوازی‌یـه‌كانی ده‌روونـی به‌دخوازتان له ڕێی هۆكاره شارستانێتی‌یه‌كانه‌وه فه‌راهه‌م بهێنن و ئاره‌زووی چڵێسـی سـك و فه‌رجتان تێر بكه‌ن؟.. یان ئایـا وا گومـان ده‌بـه‌ن كـه مه‌به‌سـت لـه‌و هـه‌موو لایه‌نـه مه‌عنـه‌وی و نـه‌رمونیان و، ئـامێر و ئه‌ندامـه هه‌ستیار و، ده‌سـت و پـێ و كۆئه‌ندامـه نـاوازه و، هه‌سـت و شعووره هه‌ستیارانه‌ی پێتان سپێرراون و له لاتان دانراون، ته‌نـها بـۆ ئـه‌وه‌ن كـه لـه تێركردنی پێداویستی‌یه نزمه‌كانی ئاره‌زووی نه‌فسی بێ‌نرخدا و له‌م ژیانه بڕاوه و كۆتـایی پـێ هـاتووه‌دا، به‌كاریان بهێنن؟

نه‌خێر.. نه‌خێر. وا نی‌یه و هه‌رگیز وا مه‌زانن. به‌ڵكو به‌دیهێنانی ئه‌و لایه‌نه ناسك و نیـان و هه‌ست و شعوورانه و دانانیان له سروشتی ئێوه‌دا، ته‌نها پاڵی به دوو بناغه‌وه داوه:

**یه‌كـه‌م**: تـاكو هه‌سـت بـه شـوكرانه‌بژێریی هـه‌موو جۆره‌كـانی ئـه‌و نیعمه‌تانـه بكـه‌ن كـه خواوه‌ندی نیعمه‌ت‌به‌خش پێی داون. واتـه: هه‌سـت بـه‌و نیعمه‌تانـه بكـه‌ن و پێیـان بزانـن و بـه به‌ندایه‌تی كردن، شوكرانه‌یان له‌سه‌ر پێشكه‌ش بكه‌ن.

**دووهـه‌م**: بـۆ ئـه‌وه‌ی واتـان لـێ بكـه‌ن كـه بـه هـه‌موو به‌شـێكی دره‌وشـانه‌وه‌كانی نـاوه جوانـه‌كانی خـواوه‌نـد – كـه گشـت بوونـه‌وه‌ری گرتووه‌تـه‌وه – ئاشنا بـبن و یـه‌ك بـه یـه‌كیان بناسن و تامیان بچێژن.

واته ده‌بێ باوه‌ڕتان به‌و ناوانه بێت و به چێژه ناسینێكی بێ‌گه‌رد بیانناسن.

هه‌موو ئـه‌و شتانه‌ی كـه مایـه‌ی كـه‌ماڵی مرۆڤن، ته‌نـها له‌ســه‌ر ئـه‌م دوو بناغه‌یـه گه‌شـه ده‌كه‌ن و، ته‌نها به‌م دوانه‌ش مرۆڤ ده‌بێت به مرۆڤی ڕاسته‌قینه.

ئێستا لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە بڕوانە، تاکو بزانیت مرۆڤ وەك ئاژەڵ نیە و، ئەم هەموو کۆئەندامانەی تەنها بۆ دەستخستنی ژیانی دنیا نەدراوەتێ:

پیاوێك "بیست" لیرەی بە خزمەتکارەکەی دا، تاکو دەستێك بەرگ و پۆشاکی لە پارچەیەکی دیاری کراو بۆ خۆی پێ بکڕێت. ئەویش ڕۆشت لە باشترین و نایابترین پارچە، دەستێك بەرگی نایاب و قەشەنگی بۆ خۆی پێ کڕی.. هەر هەمان پیاو "هەزار" لیرەی بە خزمەتگوزارێکی تری دا، بەڵام پەڕەکاغەزێکیشی لەگەڵ پارەکەدا خستە گیرفانی کە لیستی پێداویستییەکانی تێدا نووسرابوون، ئنجا ناردی بۆ کار و بازرگانی.

دیارە ئەوەی خاوەنی تۆزقاڵێك ژیری بێت، یەکسەر تێدەگات ئەم پارە زۆرە بۆ کڕینی دەستێك جل وبەرگ نییە، چونکە یەکەمیان بە بیست لیرە ئەوەی کڕی.

کەواتە ئەگەر خزمەتگوزاری دووهەم کاغەزەکەی ناو گیرفانی نەخوێنێتەوە و هەموو پارەکەی بە دوکاندارێك بدات و، بە چاولێکەریی هاوڕێ کەی دەستێك بەرگ و پۆشاك، لەخراپترین جۆریش، بەو پارە زۆرە بکڕێت، ئایا گەر کارێکی وا نەفامانە بکات، شایانی ئەوە نابێت بە توندی سزا بدرێت و تەمێ بکرێت؟

ئەی هاوڕێی بەڕێز و، ئەی دەروونی بەدخوازی خۆیشم!

ژیریتان بە چڕی ئاراستەی بیرکردنەوە بکەن و، سەرمایەی تەمەنتان بە با مەدەن و، وزە و توانای ژیانتان بۆ ئەم دنیا لەناوچووە و لە پێناوی تام و چێژێکی ماددی و لەزەتێکی ئاژەڵ ئاسادا لەناو مەبەن، چونکە ئەنجامی ئەم کارە باش نابێت و، بۆ پلەیەکی گەلێ نزمتر لە هی بێنرخترین ئاژەڵ دەبرێنە دواوە، لە کاتێکدا کە دەشزانن سەرمایەی تەمەنتان لە پلەی بەرزترین زیندەوەر گەلێ بەرز و بەنرخترە.

ئەی دەروونە بێئاگاکەم!

ئەگەر دەتەوێت شتێك لە بارەی: ئامانج و، چییەتی و، شێوە و، نهێنیی ڕاستی و، تەواویی بەختەوەریی ژیانت تێ بگەیت، ئەوا سەیری پوختەی "ئامانج و مەبەستەکانی ژیانت" بکە کە (نۆ) دانە شتن:

**یەکەمیان:** شوکرانەبژێریی هەمەکی و، کێشانە و پێوانەی نیعمەتە پاشەکەوت کراوەکانی ناو گەنجینەکانی میهرەبانیی خواوەندە، بە تەرازووەکانی ئەو هەستانەی کە لە جەستەتدا دانراون.

**دووهەمیان:** کردنەوەی گەنجینە شارراوەکانی ناوە جوانەکانی خواوەندە، بە کلیلی ئەو کۆئەندامانەی کە لە سروشتی تۆدا خواوەند دایناون و، ناسینی خواوەندە لە ڕێی ناوە جوانەکانی خۆیەوە.

**سێههەمیان:** ڕاگەیاندنی درەوشانەوە نەرم و جوان و داهێنانە بێوێنە و ناوازەکانی سنعەتە، کە ناوە جوانەکان لە تۆدا پێکیان هێناون و.. دەرخستن و پیشاندانی ئەو درەوشانەوانەیە – بەوپەڕی هەست و شعوور و زانین و بە هەموو لایەن و ڕوویەکی ژیانت – لە بەرچاوی بوونەوەران و لەم پیشانگایەی دنیادا.

**چوارەمیان:** دەرخستنی بەندایەتیی خۆتە، بە زمانی حاڵ و گوفتار، لە بەردەم پەروەردگاریتیی بەدیهێنەری خۆتدا.

**پێنجەمیان:** خۆڕازاندنەوەیە بەو لایەنە مرۆڤانە و تایبەت و نەرمونیان و جوانانەی کە درەوشانەوەی ناوە جوانەکان پێیان بەخشیویت و، دەرخستنیانە لە پێش چاوی بینەری ئەزەلیدا کە خوای گەورەیە، وەك ئەو سەربازەی کە هەرچی نیشانەی جۆراوجۆری هەیە و پادشا پێی بەخشیوە، لە جەژن و بۆنە ڕەسمیەکاندا و لە بەرچاوی پادشا خۆیدا هەڵیان دەگرێت، تاکو جێدەستی ڕێزلێنان و چاودێریی پادشا، بەرامبەر بەمی سەرباز، لە بەرچاوی پادشا خۆیدا دەربخات.

**شەشەمیان:** بینینی ڕواڵەتەکانی ژیانە بەسەر گیاندارانەوە بە چاوی بەسیرەت و بینینی زانستیانە. چونکە ئەو ڕواڵەتانەی ژیانی ئەوان، سڵاو لێکردن و بەڵگەیانە لەسەر بەدیهێنەریان.. هەروەها بینینی تەسبیحات کردنیان بۆ بەدیهێنەریان بە بینینێکی بیرلێکردنەوە و پەند لێ وەرگرتن، چونکە ئەو تەسبیحاتانەیان هێمای ژیانیانە.. هەروەها پیشاندانی پەرستنی ئەو زیندەوەرانە و شایەتی بۆدانیانە لە بەردەم بەخشندەی ژیاندا، چونکە ئامانج و ئاکامی ژیانی ئەوان ئەنجامدانی ئەو پەرستنانەیانە.

**حەوتەمیان:** ناسینی سیفەتە ڕەهاکانی بەدیهێنەری مەزن و کاروبارە پڕ لە دانستەکانیەتی و، پێوانەکردنیانە بەو زانست و توانست و ویستە هەندەکیانەی کە بە ژیانت بەخشراون. واتە ئەم شتانەی کە بە تۆ دراون، بیانکەیت بە چەند نموونەیەکی بچووك و یەکەی پێوانە تاکو سیفەتە ڕەها و مەزنەکانی ئەویان پێ بزانیت.

بۆ نموونە: هەروەك تۆ ئەم خانووەت بە ڕێکی و تەواوی و بەپێی توانست و ویست و زانستی هەندەکیی خۆت بنیات ناوە، بە هەمان جۆر دەبێ – بە ئەندازەی مەزنیی کۆشکی جیهان و ڕێکوپێکی و وردەکارییەکەی لەچاو خانووەکەی خۆتدا – ئەوەش بزانیت کە ئەو کەسەی بنیاتنەری ئەم کۆشکە مەزنەی جیهانە: بەتوانایە.. زانایە.. دانایە.. کارسازە.

**هەشتەمیان:** تێگەیشتنە لەو گوفتارانەی کە هەموو بوونەوەرانی جیهان دەیانڵێن و، پەی بردنە بەو وشە مەعنەوییانەی کە هەریەکەیان بە زمانی تایبەتیی خۆیان سەبارەت بە "یەکتایی"ی بەدیهێنەر و "پەروەردگاریتی"ی داهێنەرەکەیان دەریاندەبڕن.

**نۆهەمیان:** هەستکردنە بە پلەکانی توانست و سامانی ڕەهای خواوەند، بە تەرازووی ئەو کۆڵەواری و لاوازی و هەژاری و دەستکورتی‌یانەی کە لەناو دەروونتدان. چونکە هەروەك لە ڕێی پلەکانی برسێتی و بەگوێرەی ئەندازەی پێویستیت بە خواردەمەنی‌یەکان، شارەزای جۆرەکانی ئەو خواردەمەنی‌یانە دەبیت و هەست بە تام و لەزەتی یەك بە یەکیان دەکەیت، دەبێ بە هەمان جۆر لە ڕێی کۆڵەواری و هەژاریی نەبڕاوە و بێ‌کۆتایی خۆتەوە لە پلەکانی توانست و سامانی ڕەهای خواوەندیش تێ‌بگەیت.

ئەم "نۆ" شتانە و هاوچەشنیان، پوختە و کورتەی" **ئامانج و مەبەستەکانی ژیانت**"ن.

* "**چییەتیی ژیانی خۆیی**"شت، بە پوختی:

پێرستی ئەو شتە سەیرانەیە کە هی ناوە جوانەکانی خواوەندن و..

پێوەرێکی بچووکە بۆ ناسینی کاروبار و سیفەتە مەزنەکانی خوای گەورە و..

تەرازوویەکە بۆ ناسینی جیهانەکانی ناو گەردوون و..

لیستەیەکە ناوی ئەو شتانەی تێدایە کە لەم جیهانە گەورەیەدان و..

نەخشەیەکی ئەم گەردوونە فراوانەیە و..

کورتە و پوختەیەکی کتێبی گەورەی گەردوونە و..

کۆمەڵە کلیلێکە گەنجینە شارراوەکانی توانستی خواوەندیان پێ دەکرێتەوە و..

باشترین هەڵسەنگێنەرێکە بۆ ئەو کەماڵاتەی لە بوونەوەراندان و بەسەر کاتەکاندا بڵاو کراونەتەوە.

ئەمانە و هاووێنەیان "چییەتیی ژیانت"ن.

* ئەمەش "**وێنە و شێوەی فەرمانبەریی ژیانت**"ە:

ژیانت وشەیەکی دانایانەیە، بە قەڵەمی توانستی خوا نووسراوە و..

وتارێکی ڕەوانە، دەبێت بە بەڵگە و ڕێنمایی بۆ ناوە جوانە بینراو و بیستراوەکان.

ئەمانە و هاوچەشنیان "وێنە و شێوەی ژیانت"ن.

* "**ڕاستی و نهێنیی ژیان**"یشت ئەوەیە کە:

ئاوێنەیەکە بۆ خۆپیشاندانی "تەنیایی" و دەرکەوتنی "صەمەدییەتی" خوای گەورە. واتە: ژیانت وەك ئاوێنەیەك وایە کە درەوشانەوەی تەواوەتیی خواوەندی تەنیای صەمەدی تێدا دەربکەوێت، وەك بڵێی ئەم ژیانەی تۆ "چەقە خاڵ"ێکی وا بێت کە هەموو ئەو درەوشانەوانەی بەسەر هەموو جیهاندا دەبریسکێنەوە، لەوێ کۆ ببنەوە.

* "**تەواویی بەختەوەریی ژیان**"یشت لەوەدایە کە:

هەست بە ڕووناکی‌یەکانی ئەو درەوشانەوانەی خواوەند بکەیت لە ئاوێنەی ژیانتدا و، خۆشت بوێن و ئارەزوومەندی‌یان لە بەرامبەرەوە پیشان بدەیت. چونکە تۆ دارای هەست و

نه‌ستیت. پاشان به خۆتواندنه‌وه ده‌بێت له خۆش ویستنی ڕووناكی‌یه‌كانی ئه‌و دره‌وشانه‌وانه‌دا و جێگیر كردنیان له بیلبیله‌ی چاوی "دڵ"تدا.

به زمانی فارسی ئه‌م واتایه‌ی خواره‌وه بۆ ئه‌و حه‌دیسه قودسی‌یه وتراوه، كه تۆی مرۆڤی بۆ بڵندترین پله و پایه به‌رز كردووه‌ته‌وه:

من نگنجم در سموات و زمین از عجب گنجم به قلب مؤمنین[١]

نه‌فسه‌كه‌م!

ژیانت كه ئاوا ڕووی له‌م چه‌شنه ئامانجه به‌رزانه بێت، كه هه‌موو ئه‌م جۆره گه‌نجینه به‌نرخانه‌ی تێدا كۆ بوونه‌ته‌وه، ئایا ژیری و ویژدان ڕابه‌رداری ئه‌وه‌ن كه له چه‌ند داخوازی‌یه‌كی بێ‌نرخدا و بۆ ئه‌نجامدانی ئاره‌زووه‌كانی ده‌روونی به‌دخواز و له‌زه‌ت بردن له هه‌ندێ تام و چێژی له‌ناوچووی دنیا، به‌كاریان بهێنیت و، پاشان به فیڕۆ له ده‌ستیان ده‌ربكه‌یت؟!

جا ئه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت ژیانت به خۆڕایی له ده‌ست ده‌رنه‌چێت، ئه‌وا بیر له‌و "سوێند" و "سوێند له‌سه‌ر خوراوه" بكه‌ره‌وه كه له سووره‌تی "والشمس"دان. پاشان له‌گه‌ڵ یاد كردنه‌وه‌ی ئه‌و چیرۆكه‌ی له پێشه‌كی‌دا باسمان كرد و هێمایه بۆ ئه‌و سووره‌ته، ڕه‌فتار بكه:

بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿والشمس وضحاها ۞ والقمرإذا تلاها ۞ والنهار إذا جلاّها ۞ والليل إذا يغشاها ۞ والسّماء وما بناها ۞ والأرض وما طحاها ۞ ونفسٍ وما سوّاها ۞ فألْهَمَهَا فجُورَها وتقواها ۞ قد أفلح من زكّاها ۞ وقد خاب من دسّاها﴾** (الشمس:١-١٠).

اللهم صل على شمس سماء الرسالة وقمر بُرج النبوة، وعلى آله واصحابه نجوم الهداية. وارحمنا وارحم المؤمنين والمؤمنات. آمين.. آمين.. آمين.

---

(١) واتای ئه‌م حه‌دیسه قودسی‌یه‌یه كه ده‌فه‌رموێ: (إن السموات والأرض ضعفن أن يسعني، ووسعني قلب عبدي المؤمن الوادع اللين). ئیمامی سیوطی ده‌فه‌رموێ: "أخرجه الإمام أحمد في الزهد عن وهب بن منبه". بڕوانه: "الدرر المنتثرة" ص١٣٩-١٤٠ (وه‌رگێڕ)

# وتەی دوازدەهەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ومَنْ يُؤْتَ الحِكمةَ فقد أُوتِيَ خيراً كثيراً﴾ (البقرة:٢٦٩)

**(ئەم وتەیە ئاماژە بۆ بەراوردێکی ورد دەکات، لە نێوان حیکمەتی پیرۆزی قورئان و حیکمەتی فەلسەفەدا، هەروەك ئاماژە بۆ کورتە و پوختەیەکی پەروەردەی حیکمەتی قورئانی پیرۆزیش دەکات، کە چۆن مرۆڤ لە ژیانی خۆیی و کۆمەڵایەتی‌دا، بە پەروەردەی خۆی پێ‌دەگەیەنێت. جگە لەوەی کە ئاماژەشی تێدایە بۆ بەرزی و بڵندی و گەورەیی قورئانی پیرۆز بەسەر هەموو فەرمایشتێکی خواوەند و سەرجەم قسە و گوفتارەکاندا. واتە ئەم وتەیە چوار بنچینەی لەخۆ گرتووە).**

❑ **بنچینەی یەکەم:**

لە ڕوانگەی ئەم چیرۆکەی خوارەوە سەیری جیاوازی‌یەکانی نێوان حیکمەتی قورئان و حیکمەتی زانستەکان بکە:

فەرمانڕەوایەکی ناودار و خاوەن تەقوا، ویستی قورئانی پیرۆز بە شێوەیەك بنووسێتەوە کە شایانی پیرۆزیی واتا بەرزەکانی بێت و، لەگەڵ ئیعجازە ناوازەکەی‌دا، کە لە وشەکانی‌دا هەیە، گونجاو بێت. کەواتە ویستی بەرگێکی قەشەنگی بێ‌وێنەی وا بکاتە بەر قورئان کە لەگەڵ ئیعجازەکەی‌دا بگونجێ.

بەم جۆرە، ئەم فەرمانڕەوا هونەرمەند و نەخش و نیگارکێشە لێهاتووە دەستی بە نووسینەوەی قورئان کرد، نووسینێکی تابلۆیی سەرسووڕهێنەر، بە جۆرێکی وا کە لە هەموو جۆرە گەوهەرە بەنرخەکان و بەردە گرانبەهاکانی تێدا بەکارهێنا، تاکو بەمە ئاماژە بۆ جۆراوجۆریی ڕاستی‌یە بەرزەکانی قورئان بکات.. ئەوەبوو هەندێ لە پیتە بەرجەستەکانی ئەو قورئانەی بە: ئەڵماس و زمرووت و، هەندێکی تری بە: مرواری و مەرجان و، بەشێکی تری بە: گەوهەر و یاقووت و، جۆرێکی تری بە: زێڕ و زیو نووسی‌یەوە. تا وای لێ هات

ئه‌وه‌نده جوانیی پێ به‌خشی كه سه‌رنج ڕابكێشێت و هه‌ر كه‌س ببینێت چ خوێنده‌وار و چ نه‌خوێنده‌وار، سه‌ری سووڕ بمێنێت و، هه‌موان له‌ به‌رده‌م ئه‌م نووسینه بێهاوتایه‌دا به‌ سه‌رسووڕمان و سه‌رسامی‌یه‌وه ڕاده‌وه‌ستان، به تایبه‌ت عه‌ودالآنی "ڕاستی" كه له‌ هه‌موان زیاتر به‌ سه‌رسووڕمان و سه‌رسامی‌یه‌وه سه‌یریان ده‌كرد، چونكه ده‌یانزانی ئه‌م جوانی‌یه‌ سه‌رنج ڕاكێشه‌، جوانیی ناوه‌ڕۆكه‌كانی ده‌رده‌بڕێت كه‌ له‌وپه‌ڕی تام و چێژ و دره‌خشانی‌دایه.

پاشان ئه‌م فه‌رمانڕه‌وا گه‌وره‌یه، ئه‌و قورئانه‌ی - كه تابلێی جوان نووسراوه‌ته‌وه - خسته به‌رده‌ست فه‌یله‌سووفێكی بیانی و، زانایه‌كی موسڵمان. ئنجا فه‌رمانی پێ دان و وتی:

(هه‌ریه‌كه‌تان له باره‌ی حیكمه‌تی ئه‌م قورئانه‌وه كتێبێك بنووسێت). ئاماژه‌ی بۆ ئه‌وه‌ش كرد كه ئه‌مه تاقیكردنه‌وه‌یه، له ئه‌نجامدا پاداشتی به‌رهه‌مه باشه‌كه‌یان ده‌داته‌وه.

فه‌یله‌سووفه‌كه كتێبێكی نووسی و، زانا موسڵمانه‌كه‌ش كتێبێك.

كتێبی فه‌یله‌سووفه‌كه ته‌نها باسی نه‌خش و نیگار و جوانیی پیته‌كان و، په‌یوه‌ندی‌یان به‌ یه‌كتره‌وه و، بارودۆخ و، تایبه‌تكاری و سیفه‌تی هه‌ریه‌كه‌یانی ده‌كرد. ئیتر له‌ كتێبه‌كه‌ی‌دا به‌ هیچ جۆرێ خۆی له قه‌ره‌ی واتاكانی ئه‌و قورئانه گه‌وره‌یه نه‌دابوو. چونكه دانه‌ره‌كه‌ی هیچ شتێكی له باره‌ی زمانی عه‌ره‌بی‌یه‌وه نه‌ده‌زانی، ته‌نانه‌ت هه‌ر نه‌شی‌ده‌زانی كه ئه‌و قورئانه بێوێنه‌یه كتێبێكی گه‌وره‌ی ئه‌وتۆیه كه پیته‌كانی واتا به‌رزه‌كانی ڕاده‌گه‌یه‌نن. به‌ڵكو هه‌موو ڕوانینێكی خۆی ته‌نها ئاراسته‌ی جوانی‌یه ناوازه و بێوێنه‌كه‌ی پیته‌كان كردبوو. له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا، ئه‌م دانه‌ره: ئه‌ندازیارێكی لێهاتوو و، وێنه‌كێشێكی هونه‌رمه‌ند و، كیمیاگه‌رێكی لێزان و، زه‌ڕه‌نگه‌رێكی ئازا بوو، كتێبه‌كه‌شی به‌پێی ئه‌و هونه‌ر و زانستانه دانابوو كه شاره‌زایی ته‌واوی تیایاندا هه‌بوو.

به‌ڵام زانا موسڵمانه‌كه، هه‌ركه چاوی به‌و نووسینه جوان و ناوازه‌یه كه‌وت، یه‌كسه‌ر زانیی ئه‌وه قورئانی پیرۆزی پڕ له‌ گه‌نجینه‌ی حیكمه‌ته. ئیتر گوێی به‌ زرق و برقه ڕواڵه‌تی‌یه‌كه‌ی نه‌دا و به هیچ جۆرێك خۆی به‌ نه‌خش و نیگاری پیته جوانه‌كانی سه‌رقاڵ نه‌كرد، وه‌كو فه‌یله‌سووفه‌كه. به‌ڵكو ئه‌م زانا موسڵمانه‌ی كه تامه‌زرۆی "ڕاستی"یه، یه‌كسه‌ر ڕووی كرده ئه‌و شتانه‌ی كه به‌ ملیۆنان جاریش به‌رزتر و به‌نرختر و به‌سوودتر و جوانترن له‌وه‌ی كه‌ فه‌یله‌سووفه‌كه خۆی پێیانه‌وه سه‌رقاڵ كردبوو. ئه‌وه‌بوو به‌ وردی كه‌وته لێكۆڵینه‌وه‌ی ئه‌و "ڕاستی" و، نهێنی‌یه به‌رز و ورد و بێوێنه و جوانانه‌ی كه له‌ دووتوێی ئه‌و

نەخش و نیگارە جوانانەدان. بەم جۆرە، تەفسیرێکی تاکو بڵێی بەنرخی بۆ ئەم قورئانە خاوەن دانایی و پیرۆزە، نووسی.

ئنجا هەریەك لەم دوانە نووسینەکەی خۆی خستە بەردەست فەرمانڕەوا گەورەکە. فەرمانڕەواش لە پێشدا دانراوی فەیلەسووفەکەی وەرگرت و بە وردی تەماشای کرد، بینیی ئەم مرۆڤە لەخۆڕازی و سروشت پەرستە، تەنانەت یەك دانە حیکمەتی ڕاستەقینەی نەنووسیوە! هەرچەندەش درێغیی نەکردووە و چیی لە توانادا بووە بەکاری هێناوە، چونکە هیچ کام لە واتاکانی تێنەگەیشتووە، بەڵکو لەوانەیە سەریشی لێ تێکچوو بێت. جا لەبەر ئەوەی ئەو فەیلەسووفە لای وابوو ئەم قورئانە تەنها بریتی‌یە لەو نەخش و نیگارە جوان و بێ وێنانە و، بایەخی بە واتا بەرزەکانی نەدا، ئەوا بەم کارەی ئەوەی دەربڕی کە هیچ ڕێزێکی لەو قورئانە نەناوە و لە ڕاستی‌دا مافی خۆی نەداوەتێ. لەبەر ئەوە، فەرمانڕەوا داناکە دانراوی ئەو فەیلەسووفەی وەرنەگرت و دایەوە بە سەروچاوی‌دا و لە کۆڕەکەی خۆی دەری کرد.

پاشان دانراوی زانا موسڵمانە لێکۆڵەرە وردەکارەکەی هەڵگرت و سەیری کرد. بینیی تەفسیرێکی تابڵێی بەرز و بەنرخە. لەبەر ئەوە پیرۆزبایی لێ کرد و ڕێزی لە کارەکەی نا و، وتی: حیکمەتی ڕاستەقینە ئەمەیە و، لە ڕاستی‌دا ناوی: "دانا" و "زانا" دەبێ تەنها لە خاوەنی ئەم کتێبە بنرێت، نەك ئەوی تر. چونکە ئەوی تر تەنها هونەرمەندێکی لێزانە و، لە دەرەوەی بازنەی ئەو شتانەی دەیانزانێت هەرچی بڵێت، لە سنووری خۆی دەردەچێت.

لە پاش ئەمە، فەرمانڕەوا پاداشتی باشی زاناکەی دایەوە و، فەرمانی دەرکرد کە لە بەرامبەر هەر پیتێکی ئەو کتێبەی دایناوە "دە" لیرەی زێڕینی خەڵات بکرێت.

* * *

برای بەڕێزم!

ئەگەر لە هەموو لایەنەکانی ئەم چیرۆکە تێگەیشتوویت، ئەوا فەرموو سەیری ڕووە ڕاستەقینەکەی بکە:

ئەو قورئانە جوان و ڕازاوەیە، ئەم گەردوونە بێوێنە و ناوازەیەیە و، مەبەست لەو فەرمانڕەوا گەورە و بە هەیبەتەش، فەرمانڕەوای ئەزەل و ئەبەدە کە خوای گەورەیە..

ئەو دوو پیاوەیش: بیانی‌یەکەیان بریتی‌یە لە زانستی فەلسەفە و دانایانی ئەو ڕێگایە.. ئەوی تریشیان قورئان و قوتابییانی قورئانن..

بەڵێ، قورئانی پیرۆز (واتە ئەو قورئانەی کە دەخوێندرێتەوە) بەرزترین و گەورەترین تەفسیر و ڕەوانترین و ڕوونترین تەرجومانی ئەم گەردوونە بێ وێنەیەیە، کە ئەویش (واتە گەردوون) خۆی لە خۆیدا قورئانێکی تری بەرجەستە و (بینراو)ە.

بەڵێ، تەنها ئەو قورئانە پڕ لە حیکمەتەیە کە جینی و ئادەمیزاد ڕێنمایی دەکات بۆ ئەو ئایەتە گەردوونی‌یانەی کە قەڵەمی توانستی خواوەند لەسەر لاپەڕەکانی گەردوونی فراوان و لەسەر پەڕەی کات و سەردەمەکاندا نووسیونی و، هەر تەنها قورئانە کە لە ڕوانگەی "واتای حەرفی"یەوە دەڕوانێتە بوونەوەران، کە هەریەکەیان پیتێکی پڕ لە واتان. واتە: لەو گۆشەیەوە تەماشای بوونەوەران دەکات کە دەری دەخات ئەم بوونەوەرانە بەڵگەن لەسەر بەدیهێنەری مەزنی خۆیان، جا کە لەم گۆشەیەوە سەیری کردن، دەڵێت:

(چەندە جوان و ڕەنگین بەدی هێنراون و، چەندە بە جوانی و ڕوونی دەبن بە بەڵگە لەسەر بەدیهێنەری خۆیان).

بەم جۆرە، قورئانی پیرۆز جوانیی ڕاستەقینەی بوونەوەران دەردەخات.

بەڵام ئەوەی پێی دەڵێن "زانستی حیکمەت" کە فەلسەفەیە، ئەوا لە سەرنجدانی ئارایشتکاریی پیتەکانی بوونەوەراندا نوقم بووە و، ئەوەندە لە بەردەم پەیوەندی‌یەکانی نێوان ئەم پیتانەدا سەرسام ماوە کە ئاگای لە ناوەڕۆك و حەقیقەت نەماوە و لێیان دوور کەوتووەتەوە و ڕێی ون کردووە!

چونکە کاتێ کە دەبوو سەیری بوونەوەرانی وا بکردایە کە هەریەکەیان پیتێکن و بەڵگەن لەسەر نووسەرەکەیان، کەچی وای نەکرد، بەڵکو بە "واتای ئیسمی" سەیری کردن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گوایا: بوونەوەران دارای واتای سەربەخۆن و، لەم ڕوانگەیەوە لە بارەیانەوە دەدوێت و، لە بریی ئەوەی بڵێت: "چەندە جوان بەدی هێنراوە"! دەڵێت: "چەندە جوانە"!

بەم وتەیەش جوانیی ڕاستەقینە لەو شتە دادەماڵێت کە باسی دەکات، بەم کارەشی، کە گێڕانەوەی جوانیی شتانە بۆ خودی خۆیان، لە ڕێزی هەموو بوونەوەران دادەگرێت و، وایان لێ دەکات کە هەر هەموویان لە قیامەتدا سکاڵای لە دەست بکەن.

بەڵێ، ئەو فەلسەفەیەی کە وا بەم چەشنە مولحیدانەیە بیر دەکاتەوە، لە ڕاستی‌دا وڕێنە و چاوبەستێکی ئەوتۆیە کە هیچ بناغەیەکی ڕاستیی نی‌یە و، بریتی‌یە لە بێ‌نرخ کردنی هەموو بوونەوەران بە گشتی.

❑ **بنچینەی دووهەم:**

بۆ ئەوەی بگەینە ڕادەی جیاوازییەکانی نێوان ئەو پـەروەردە ڕەوشتییانەی کـە قورئـانی پیرۆز قوتابییەکانی خۆی لەسەر پەروەردە دەکات و، ئەو وانەیەش کە حیکمەتی فەلسەفە بە شوێنکەوتووانی خۆی دەڵێتەوە، وا بەراوردێك لە نێوان هەردووکیاندا ساز دەکەین:

دەبینین: قوتابییە دڵسۆزەکەی فەلسەفە فیرعەونێکە بۆ خۆی، بـەڵام فیرعـەونێکی زەلیلـە! چونکە لە پێناوی بەرژەوەندیی خۆیدا بێنرخترین شت دەپەرستێ و هەر شتێك سوودی پێ بگەیەنێت دەیکات بە پەرستراوی خۆی!

پاشـان ئـەو قوتابییـە سەرسـەختەی فەلسـەفە هەمیشـە لـە عینـادی و سـەرپێچیدایە، بـەڵام سەرپێچی کارێکی هەژارە! چونکە لە پێنـاوی ئـەوەی لـەزەتێکی دەسـت بکـەوێت، بەوپـەڕی زەلیلی ڕازی دەبێت.. هەروەها تـابلێی عینـادی دەکـات، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا گەلـێ بـێ نرخە! چونکە زەلیلی و ملکەچی بۆ کەسانێك قبووڵ دەکات کە وەك شـەیتان وان، تەنانـەت قاچیشیان ماچ دەکات!

پاشـان ئـەو قوتابییـە موڵحیـدەی فەلسـەفە، مرۆڤێکـی لـەخۆبایی و خۆبـەزل زانـە، بـەڵام خۆبەزل زانێکی وا کە ئەوپەڕی کۆڵەواری لە خۆیدا شك دەبات، چونکە لـە دڵـی خـۆیدا هیچ کەسێك شك نابات پشتی پێ ببەستێت و پاڵی پێوە بدات.

پاشـان ئــەو قوتابییــەی فەلســەفە هەلپەرســتە و، تەنــها بــە دوای بــەرژەوەندیی خــۆیدا دەگــەڕێت و، جگــە لــە خــۆی کــەس نــابینێت و، ئەوپــەڕی لێــبڕان و ئــاواتی ئەوەیــە کــە ئارەزووەکانی "نەفس و سك و فەرج"ی دابین بکات. ئنجـا لەمەشـدا فێڵبـازە، چونکـە لـەناو بەرژەوەندیی نەتەوەدا بە شوێن بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیدا دەگەڕێت!

بـەڵام قوتـابیی دڵسۆزی قورئـان: بەندەیـە (واتـە بـەندەی خـوا) بـەڵام بەندەیـەکی تـابڵێی سەربەرزە، بۆ گەورەترین بەدیهێنراویش سەری دانانەوێنێت و زەلیلی قبووڵ ناکات.

پاشان قوتابییەکی لەخۆبوردە و نەرمونیانە، بەڵام جگە لە بەدیهێنـەری گـەورەی خـۆی و فەرمانەکانی، هیچ کاتێك بە ویستی خـۆی، لـە بـەردەم هیـچ کـەس و هیـچ شــتێکدا خـۆی زەلیل و ڕسوا ناکات و سەری بۆ دانانەوێنێت.

پاشـان قوتابییـەکی هـەژار و لاوازە و، دڵنیاشـە لـە هـەژاری و لاوازیـی خـۆی. بـەڵام لـە بەرامبـەر هــەموو شــتێکەوە - جگــە لــە خــوا - دەوڵەمــەندە و، دڵنیایــە کــە خاوەنــە سەخاوەتمەندەکەی لە قیامەتدا گەنجینەی هەمیشەیی لەبننەهاتووی بۆ پاشەکەوت کردووە..

ئنجا ئەم قوتابی‌یەی قورئان بەهێزە! چونکە پـاڵی بـە هـێزە ڕەهـا و بێ‌سنوورەکەی خـوای گەورەی خۆیەوە داوە و پشتی پێ بەستووە.

پاشان هەر کارێك ئەنجام بدات، تەنها لـە پێنـاری ڕەزامـەندیی خـوادا دەیکـات. تەنانـەت کاتێ هەوڵ بۆ پێگەیشتن و بلاو کردنەوەی چاکـە و ڕەوشـت بـەرزی دەدات، ئـەوا تەنـها لـە بازنەی ڕەزامەندی‌یەکانی خوادا ئەم هەوڵ و تەقەلایە دەدات.

بەم چەشنە و، لە ئەنجامی بەراوردی نێوان قوتابی‌یانی ئەم دوو حیکمەتەوە، لەو دوو جۆرە پەروەردەیە تێ‌دەگەیت کە ئەم دوو حیکمەتە قوتابییانی خۆیانی لەسەر پەروەردە دەکەن.

❑ **بنچینەی سێ‌هەم:**

ئنجا ئەو پەروەردەیەش کە حیکمەتی فەلسەفە و حیکمەتی قورئـان بـە کۆمـەڵگای مرۆڤـی دەبەخشن، بەم جۆرەی خوارەوەیە:

حیکمەتی فەلسەفە لە ژیانی کۆمەلایەتی‌دا "هێز" بە خاڵی پشت پێ‌بەستن دادەنێت و.. لە هەموو شتێکدا "سوود"ی مەبەسـتە و.. "مشـتومڕ" دەکـات بـە دەسـتووری ژیـان و.. "ڕەگـەز پەرستی" و "قەومییـەتی سـەلبی" دەکـات بـە پەیوەسـت و پـەیوەندی‌دەری نێـوان کۆمـەڵانی مرۆڤ.

ئنجا بەروبوومی ئەم حیکمەتەی فەلسەفەش بریتی‌یە لە: تێر کردنی ئـەو حـەز و خواسـت و ئـارەزووە پەنهانانـەی کـە زیـاتر ئـارەزووی "دەروون" دەورووژێنـن و پـەتی پـێ دەبچـڕن و بـە تەواوی بەرەڵای دەکەن.

شتێکی ئاشکرایشە کە "هێز" ئەنجامەکەی: "لەسنوور دەرچوون" دەبێت و.. "سوود"یـش "پالپـالێن"ی لـێ پـەیدا دەبێـت، چونکـە بەشـی دابـین کردنـی پێداویسـتی و ئارەزووەکـانی هـەموان ناکـات و.. "مشـتومڕ"یـش زۆرانکـاریی لـێ دەوەشـێتەوە و.. "ڕەگەزپەرسـتی"ش "لەسنوور دەرچوون"ی لـێ پەیدا دەبێت و، بەم چەشنە ڕەگەزایەتی‌یەکە گەشـە دەکـات و بـە هەڵلووشینی یەکتر پەرە دەسێنێت و لەسەر حسابی ڕەگەزەکانی تر فراوان دەبێت!

ئـا لـێرەوە بۆمـان دەردەکـەوێت کـە بۆچـی بەختـەوەری لـە گـرۆی مرۆڤایـەتی سەندراوەتەوە و لەبەری داماڵراوە؟ هۆکەی تەنها هەڵپە و ڕاکردنـە بـە دوای ئـەم حیکمەتـەی فەلسەفەدا!

بەلام حیکمەتی قورئانی پیرۆز لە بریی هێز "حەق" دادەنێت بە خـاڵی پشـت پێ‌بەستن و.. لـە بریـی سـوود "ڕەزامـەندیی خـوای گـەورە" دەکـات بـە ئامـانج و مەبەسـت و.. لـە جیـاتیی

مشتومڕ "یارمەتی و هاوکاری" دەکات بە دەستوور و بناغە لە ژیاندا و.. لە بریی ڕەگەزپەرستی و قەومییەتی سەلبیش دەست بە "ئایین و نیشتمان و پیشە"وە دەگرێت، تاکو بیانکات بە پەیوەندیدەری نێوان کۆمەلان.

ئنجا سنووردانان بۆ دەستدرێژی و لەسنوور دەرچوونەکانی "دەروون" و.. هاندانی "گیان" بۆ ڕۆیشتن و پەرواز بوون بەرەو کار و ئاقار و ئامانجە بلندەکان و.. دابین کردنی هەستە بەرزەکانی "گیان"، دەکات بە مەبەستی گەورە و ئامانجی گشتیی خۆی، تاکو مرۆڤ بەرەو کەمال و ڕەوشتە بەرزەکانی ببات و سەری بخات.

چونکە:

ئەنجامی "حەق"، "یەکگرتن"ە و.. هی "ڕەوشت بەرزی"ش "پشتگیری"یە و.. دەستووری: "یارمەتی و هاوکاری"، "فریاکەوتنی یەکتر"ی لێ دەوەشێتەوە و.. "ئایین"یش "برایەتی و پشتگیریی" یەکتری لێ پەیدا دەبێت و.. ئنجا "لەغاو کردنی نەفس و هەلپەکاریيەکانی" و، "سەربەست کردنی گیان و هاندانی بەرەو کەمال"، هەموو ئەمانە دەبن بەهۆی: "بەختەوەریی هەردوو دنیای مرۆڤ"!

**❑ بنچینەی چوارەم:**

ئەگەر دەتەوێت تێبگەیت لەوەی کە چۆن قورئانی پیرۆز بەسەر هەموو وتە و فەرمایشتەکانی تری خوای گەورە و هەموو گوفتارێکدا بلندترە و، دەتەوێت بزانیت چۆن لە هەموو وتەیەك بەرزترە، ئەوا بە وردی سەرنجی ئەم دوو نموونەیەی خوارەوە بدە:

*نموونەی یەکەم:*

پادشا دوو جۆر گوفتار و فەرمایشتی هەیە:

یەکەمیان: گوفتارێکی تایبەتیيە کە بەهۆی تەلەفۆنێکی تایبەتیيەوە لەگەل یەکێك لە هاوولاتیيەکانیدا سەبارەت بە کارێکی هەندەکی و ئیشێکی تایبەتیی خۆیەوە، دەیکات.

ئەوی تریان: قسەکردنە بە ناوی پادشایەتیی پڕ شکۆی خۆی و بە ناونیشانی خەلافەتی گەورە و بە چۆنێتیی فەرمانڕەوایی گشتی و بە مەبەستی بلاو کردنەوەی فەرمانە پادشاییيەکانی لە هەموو لایەکدا. واتە ئەم یەکەیان گوفتارێکە لەگەل کەسێك لە نێرراوانی خۆی یان یەکێك لە فەرمانبەرە گەورەکانیدا. کەواتە ئەم گوفتارە سەبارەت بە شتێکی گەورەیە و، پەیوەندیشی بە هەموانەوەیە.

*نموونەی دووهەم:*

پیاوێك ئاوێنەیەکی بە دەستەوەیە و ڕووەو "خۆر" ڕایگرتووە. دیارە ئاوێنەکە بە ئەندازەی گەورە و بچووکیی خۆی ڕووناکیيەك وەردەگرێت کە هەر حەوت ڕەنگەکانی شەبەنگی

خۆری تێدایە. کەواتە ئەم پیاوە بەپێی ئەندازەی ئەو ئاوێنەیە سوود لە خۆر وەردەگرێت، وەك ئەوەی ڕووناکیی ئاوێنەکەی ئاراستەی ژوورە تاریکەکەی یاخود "شەتڵگا" تایبەتی و بچووکەکە سەرگیراوەکەی خۆی بکات. ئەوەندە هەیە ئەو سوودەی کە لە خۆرەوە وەری دەگرێت سوودێکی کەمە، چونکە تەنها بەپێی توانای ئاوێنەکەی سوود لە ڕووناکیی خۆر وەردەگرێت، نەك بە ئەندازەی گەورەیی خۆر.

لە هەمان کاتدا پیاوێکی تر واز لە ئاوێنە دەهێنێت و، ڕاستەوخۆ ڕوو دەکاتە خۆر و سەیری شێوە و گەورەیی خۆر دەکات، ئنجا دەڕواتە سەر چیایەکی بەرز و بڵند و سەیری درەوشانەوەی دەستەڵاتداریی فراوان و شکۆمەندیی خۆر دەکات و بێپەردە ڕوو بە ڕووی ڕادەوەستێت. پاشان دەگەڕێتەوە لە خانووە بچووك و "شەتڵگا" سەرگیراوە تایبەتی‌یەکەی خۆی‌دا چەند کلاوڕۆژنەیەکی فراوان ڕووەو خۆر دەکاتەوە و، بەم پێیە ڕێگایەك دەدۆزێتەوە بۆ سوودوەرگرتن لەو خۆرەی کە لەو جێگا بەرز و بڵندەی ئاسماندایە. ئنجا ئەم پیاوە لەگەڵ خۆر و ڕووناکی‌یەکەی‌دا - بە زمانی حاڵ - ئەم وتووێژە سوپاسگوزاری‌یانەیە دەکات:

(ئەی ئەو خۆرەی کە لەسەر تەختی جوانیی جیهاندا دانیشتوویت! ئەی گوڵی گەشاوەی ڕووی ئاسمان! ئەی ئەو خۆرەی کە جوانی و ڕووناکیت بە زەوی و، خەندە و شادیت بە گوڵان بەخشیوە! هەروەك گەرمی و ڕووناکیت بە گشت لایەکی جیهاندا بڵاو کردووەتەوە، ماڵ و شەتڵگا بچووکەکەی منیشت بەسەر کردووە و لە گەرمی و ڕووناکیی خۆت پێ بەخشیون).

ئەم پیاوە دەتوانێت، بە زمانی حاڵ، ئەم چەشنە گفتوگۆیە لەگەڵ خۆردا بکات، بەڵام خاوەنی ئاوێنەکە ناتوانێت بەم شێوازە ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵدا بکات، چونکە شوێنەواری ڕووناکیی خۆر بەپێی سنووری ئاوێنەکەی دەبێت و بە ئەندازەی توانای ئەو ئاوێنەیە ڕووناکیی دەست دەکەوێت.

ئنجا - دوای ئەمە - وەرە لە ڕوانگەی ئەم دوو نموونەیەوە تەماشای قورئانی پیرۆز بکە، با هەست بە ئیعجازە بڵند و پایەدارەکەی بکەیت. بەڵێ، قورئانی پیرۆز دەفەرموێ:

**﴿وَلَوْ أَنَّ ما في الأَرضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقلامٌ والْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ ما نَفِدَتْ كَلِماتُ الله إِنَّ الله عزيزٌ حَكيمٌ﴾** (لقمان:٢٧).

بەخشینی پلەی هەرە بەرز بە قورئانی پیرۆز لە نێوان هەموو وتە لەسنووربەدەرەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە قورئانی پیرۆز لە عەرشی ئەعزەم و، لە ئیسمی ئەعزەم و، لە پلەی

هەرە گەورەی هەموو یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورەوە، نازڵ بووە. کەواتە قورئانی پیرۆز بریتی‌یە لە:

"فەرمانی خوای گەورە" بەو سیفەتەی کە خوای گەورە "خوای هەموو بوونەوەرانە"و..

"فەرمایشتی ئەو" بەو سیفەتەی کە "بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانەکانە" و..

"فەرموودەی بەرزی ئەو" بەو سیفەتەی کە پەروەردگاری ڕەهایە لە بوونەوەردا و..

"فەرمایشتی ئەزەلیی ئەو" کە بە ناوی پادشایەتی و دەستەڵاتداریی هەمەلایەنە و مەزنەوە فەرموویەتی و..

"تۆماری ڕێزلێنانی خواوەندی میهرەبان"ە کە لەو بەزەیی‌یە فراوانەوە هەڵقوڵاوە کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە و..

"کۆمەڵە نامەیەکی پەروەردگاری‌یانە"ی ئەوتۆیە کە مەزنیی خوایەتیی ئەو ڕوون دەکەنەوە، چونکە لە سەرەتای هەندێ لەم نامانەدا چەند هێما و پەرلە(شفرة)یەك بەکار هێنراوە کە ئەمە دەگەیەنن و..

هەروەها ئەو کتێبە پیرۆزەیە کە دانایی لێ دەبارێت.

لەبەر ئەم هەموو نهێنی‌یانەیە کە ناوێکی شایانی خۆی لێ نراوە، ئەوەتا پێی دەوترێت: "کلام الله" واتە: گوفتار و فەرمایشتی خوا!

بەڵام فەرموودەکانی تری خواوەند بەشێکیان بە بایەخ پێدانێکی تایبەتی و، بە ناونیشانێکی هەندەکی و، درەوشانەوەیەکی هەندەکیی ناوێکی تایبەتی و، پەروەردگاریتی‌یەکی تایبەتی و، دەستەڵاتێکی تایبەتی و میهرەبانی‌یەکی تایبەتی‌یەوە، هەڵقوڵاون.

کەواتە بەپێی "تایبەتی" و "هەندەکێتی"ی ئەم فەرموودانە، پلەکانیان جیاواز دەبن. زۆربەی ئیلهامەکان لەم بەشەن، بەڵام لە نێوان خۆیاندا پلەکانیان تابڵێی جیاجیایە.

بۆ نموونە: ئاسایی‌ترین و هەندەکی‌ترینی ئیلهامەکان هی ئاژەڵ و زیندەوەرانە، پاشان هی خەڵکی عەوام، ئنجا هی زۆربەی مەلائیکەتەکان، ئنجا ئیلهامی ئەولیاکان، پاشان ئیلهامی گەورە مەلائیکەتانی خواوەندە.

لەم نهێنی‌یەوەیە کە هەندێ جار لە وەلی‌یەك دەبیستیت دەڵێت: "حدثني قلبي عن ربي". واتە: (دڵم لە خوای پەروەردگارمەوە بۆی گێڕامەوە...) واتە بەو تەلەفۆنەی کە لە دڵی‌دا هەیە، بە بێ بوونی هیچ هۆکارێك لە مەلائیکەتان. کەچی لێی نابیستیت بڵێت: "پەروەردگاری جیهانیان بۆی گێڕامەوە". یان دەڵێت: "دڵم عەرش و ئاوێنەیەکە بۆ

دره‌وشانه‌وه‌كانی په‌روه‌ردگارم"، كه‌چی نالێت: "عه‌رشی په‌روه‌ردگاری جیهانیان". چونكه به‌پێی لێهاتوویی و توانای خۆی و به هه‌ڵدانه‌وه‌ی نزیكه‌ی حه‌فتا هه‌زار په‌رده، ده‌توانێت به‌شێكی له گوفتارێكی په‌روه‌ردگاری خۆی ده‌ست بكه‌وێت.

به‌ڵێ، به ئه‌ندازه‌ی به‌رزیی گوفتارێكی پادشا كه له ڕوانگه‌ی پادشایه‌تی‌یه‌كه‌یه‌وه كردبێتی، به‌سه‌ر گوفتارێكی تری خۆی كه له‌گه‌ڵ یه‌كێك له هاوولاتی‌یانی‌دا ده‌یكات و.. به گوێره‌ی زۆریی ئه‌و سووده‌ی كه ڕاسته‌وخۆ له ڕووناكیی خۆری ناوجه‌رگه‌ی ئاسمان وه‌رده‌گیرێت، له چاو ئه‌و ڕووناكی‌یه‌ی كه له ئاوێنه‌كه‌دا دره‌وشایه‌وه.. به‌م ئه‌ندازه‌یه، ده‌توانین تێبگه‌ین له: به‌رزیی قورئان به‌سه‌ر هه‌موو گوفتار و فه‌رمووده‌كانی تری خواوه‌ند و كتێبه ئاسمانی‌یه‌كانی تردا.

كه‌واته هه‌موو كتێب و صوحوفه ئاسمانی‌یه‌كان له دوای قورئانه‌وه دێن و له پله‌ی دووهه‌مدان و، هه‌ریه‌كه‌یان پله و پایه‌ی بڵندی خۆی هه‌یه و به‌شێكی له‌و نهێنی و به‌رزی‌یه تێدایه. خۆ ئه‌گه‌ر هه‌رچی وته‌ی ڕێكوپێك و جوانی به‌ره‌ی جینني و ئاده‌میزاد هه‌ن - كه له قورئان وه‌رنه‌گیرابن - كۆ ببنه‌وه، ئه‌وا هه‌رگیز ناتوانن نزیكی ئه‌و پله‌یه ببنه‌وه و بگه‌نه ئه‌و ئاسته‌ی كه ببن به هاوچه‌شنی قورئانی پیرۆز.

جا ئه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت شتێك تێبگه‌یت له‌وه‌ی كه قورئانی پیرۆز له "ئیسمی ئه‌عزه‌م" و له پله‌ی هه‌ره گه‌وره‌ی هه‌موو یه‌كێك له ناوه جوانه‌كانی خوای گه‌وره‌وه نازڵ بووه، ئه‌وا سه‌رنجی "آية الكرسي" و ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزانه‌ی خواره‌وه بده و، به وردی بیر له واتا گشتی و به‌رزه‌كانیان بكه‌ره‌وه:

﴿وعِنْدَهُ مَفاتِحُ الغَيب﴾ (الأنعام:٥٩).

﴿قُلِ اللّهُمَّ مالِكَ المُلْكِ﴾ (آل عمران:٢٦).

﴿يُغْشي اللَّيْلَ النَّهارَ يَطْلُبُهُ حَثيثاً والشمسَ والقَمَرَ والنُّجُومَ مسخَّراتٍ بِأَمْرِه﴾(الأعراف:٥٤).

﴿يا أَرضُ ابلعي ماءَكِ ويا سماءُ أَقلعي﴾ (هود:٤٤).

﴿تُسَبِّحُ له السمواتُ السَّبْعُ والأَرضُ ومَن فيهن﴾ (الإسراء:٤٤).

﴿ما خَلْقُكُمْ ولا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ واحدة﴾ (لقمان:٢٨).

﴿إنّا عَرَضْنا الأَمانَةَ على السَّموات والأَرضِ والجِبالِ﴾ (الأحزاب:٧٢).

﴿يومَ نطوي السَّماءَ كَطَيِّ السِّجلِّ للكُتُبِ﴾ (الأنبياء:١٠٤).

﴿**وما قدروا الله حق قدره والأَرضُ جـــميعاً قبضَتُهُ يومَ القيامة**﴾ (الزمر:٦٧).

﴿**لو أَنْزَلْنا هذا القرآنَ على جبلٍ لرأيتَهُ...**﴾ (الحشر:٢١).

هەروەها ئایەتەکانی تری هاوچەشنیان.

پاشان بە وردی سەرنج لەو سوورەتانە بدە کە بە ﴿**الحمد لله**﴾ و ﴿**تسـبح ...**﴾ دەست پێ دەکەن، تاکو تیشکی ئەم نهێنی‌یە گەورەیە ببینیت. پاشان سەیری ئەو سـوورەتانە بکـە کـە بە: ﴿**الم**﴾ و ﴿**الر**﴾ و ﴿**حم**﴾ دەست پێ دەکەن، تاکو تێبگەیت لە ڕادەی گرنکیـی قورئـان لە لای خوای گەورەی پەروەردگاری جیهانیان.

جا ئەگەر لەم نهێنی‌یـە وردەی ئـەم بنچینـەی چوارەمـە تێ گەیشتیت، ئـەوا دەتوانیـت لـەو نهێنی‌یەش تێبگەیت کە زۆربەی ئەو "وەحی"یانەی بۆ پێغەمبەران - درووديان لەسـەر بێـت - نازڵ بوون، بەهۆی مەلائیکەتەوە بووە، بەڵام "ئیلهام" بە بێ هیچ هۆکارێك ڕوو دەدات..

هەروەها لە نهێنیی ئەوەش تێ‌دەگەیت کە گـەورەترین "وەلی" ناگاتـە ئاستی هیـچ کـام لـە "پێغەمبەران"..

هەروەها لە مەزنی و پیرۆزیی قورئان و پایەداریی ئیعجازەکەی تێ‌دەگەیت..

هـەروەها تێ‌دەگـەیت لـە نـهێنی و حیکمـەتی پێویستیی "میعـراج". واتـە: تێ‌دەگـەیت لـە نـهێنیی ڕۆشـتنی پێغەمبـەر ﷺ بۆ ئاسـمانە بەرزەکان و "سـدرة المنتـهى" و، "قـاب قوسـين أو أدنى" و، گفتوگۆ کردنـی لەگـەڵ خواوەنـددا، هەرچـەندەش خـوای گـەورە لـە ڕەگـی لامـل لێیەوە نزیکترە و، پاشان گەڕانەوەی بۆ جێی خۆی لە ماوەی چاوترووکاندنێکدا.

بەڵـێ، هـەروەك "لــەتکردنی مـانگ" موعجیزەیەکـە بـۆ چەسـپاندن و ڕوونکردنـەوەی پێغەمبـەرێتیی ئەو پێغەمبـەرە ﷺ بۆ گرۆی جیننی و ئادەمیزاد.. "میعراج"یـش موعجـیزەی بەندایـەتیی پێغەمبـەرە ﷺ بـۆ خـواوەند و، خۆشـەویستیی ئـەوی لای خـوای گـەورە بـۆ ڕۆحانیات و مەلائیکەتان دەرخست.

اللهم صل وسلم عليه وعلى آله كما يليق برحمتك وبحرمته. آمين.

# وتەی سیازدەهەم

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ القُرْآنِ ما هُوَ شِفاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلمُؤْمِنِين﴾ (الإسراء:٨٢)

﴿وما عَلَّمْناهُ الشِّعْرَ وما يَنْبَغي لَه﴾ (يس:٧٠)

ئەگــەر دەتــەوێت بــەراوردێك لــە نێــوان حیكمــەتی قورئــانی حــەكیم و زانســتە فەلســەفی‌یەكاندا ســاز بكــەیت و، بزانیــت چ پــەند و ئامۆژگاری‌یــەك لــە هــەردووكیان وەردەگیرێت و، ئەو زانستانەت دەست بكەوێت كە لە هەردووكیاندا هەن، ئـەوا بە وردی و تێڕامان سەرنج لەمەی خوارەوە بدە:

قورئانی پیرۆز لە ڕێی ڕوونكردنەوە وردبین و بەهێزەكانی خۆیـەوە پـەردەی "ئولفـەت" و ڕاهاتن دەدڕێنێت كە بەسـەر ڕوخساری سـەرجەم بوونـەوەرانی گەردوونـەوە دادراونەتـەوە، ئەو بوونەوەرانەی وا باس دەكرێن كە چـەند شتێكی ئاسایی بن، كـەچی لـە ڕاستی‌دا چـەند كارێكی دەراسا و موعجـیزەی مـەزنی توانستێكی نـاوازەن. قورئـانی پیرۆز بە دڕاندنی ئـەو پەردەیە گەلـێ ڕاستیی سەرسوورهێنەر بۆ هەموو خـاوەن هەسـت و شعوورێك دەخاتـە ڕوو، هەروەك سەرنجیان بۆ لای ئەو وانە ڕەوانانـە ڕادەكێشـێت كـە جێـی پـەند و ئامۆژگـارین. بـەم كارەشی دەرگای گەنجینەیەكی نەبڕاوەی زانست لە بەردەم ژیری‌یەكاندا دەخاتە سەرپشت.

بەڵام حیكمەتی فەلسەفە، هەموو موعجیزاتی خواوەند لە ژێر پەردەی ئولفەت و ڕاهـاتندا دەشـارێتەوە و - بێ بایـەخ پێـدان - بەســەریاندا تێ‌دەپـەڕێت، تەنانـەت پشـت گـوێشـیان دەخات و، تەنها چەند دانەیەكی كەمی "بەدیهاتووی نامۆ و دوور لـە وردەكـاریی بەدیـهاتن و كـەماڵی سروشتی" دەخاتـە پێش چـاوی خـاوەن هەستان و، پێـی وایـە تەنـها ئـەو نموونانـە حیكمەت و پەندیان تێدایە!

بۆ نموونە: ئەم مرۆڤە ڕێكوپێكـەی كـە لـە "أحسن تقويـم"دا بـەدی هێنـراوە و موعجـیزاتی توانستی خوای گەورەی تێدا جەم بووە، "حیكمەتی فەلسەفە" كە سەیری دەكات، بە شتێكی ئاسایی دەیبینێت. بـەڵام سـەرنجی خـەڵكی بۆ لای ئـەو چەشـنە مرۆڤـە نـاڕێك و شـێواوانە ڕادەكێشـێت كـە لـە كـەماڵی بەدیـهاتن بێ‌بەش بـوون، وەك ئـەو مرۆڤـەی سـێ "قـاچ" یـان

دوو "سەر"ی بۆ دروست کرابێت، دەچێت سەرنجی پەند و سەرسوورمانیان بۆ لا ڕادەکێشێت!

نموونەیەکی تر: ژیاندنی گشت وردیلە و بێچووانی زیندەوەران بەوپەڕی ڕێکوپێکی لە لایەن گەنجینەکانی غەیبی پەنهانەوە، ئەم کارەی کە ناسکترین و گشتیترین موعجیزاتی میهرەبانیی خواوەند لە بوونەوەراندا دەنوێنێت، ڕوانینی حیکمەتی فەلسەفە بە کارێکی "نەگەڵ ڕاهاتووی" ئاسایی دەیبینێت و، بە پەردەی ناشکوری و پێنەزانین دایدەپۆشێت. کەچی سەرنجی خەڵکی بۆ لای ژیاندنی مێروویەك ڕادەکێشێت کە لە ڕێسا لایداوە و لە دەستە هاوڕەگەزەکەی خۆی دوور کەوتووەتەوە و بە تەنیا و نامۆیی لە بنکی دەریاکاندا دەژی و خواردن و گوزەرانی لەسەر گەڵا ڕووەکێکی سەوزی بنکی دەریایە، بە ڕادەیەك ئەو نەرمونیانی و میهرەبانییەی خوای گەورە کە لەو مێرووەدا دەردەکەوێت، سۆز و بەزەیی و خەمی ڕاوچییان دەبزوێنێت و دەیانخاتە پەژارە و گریانەوە[1]!

لە تیشکی ڕووناکیی ئەم نموونانەدا سەیری فراوانیی سەروەت و سامانی "خواناسین"ی قورئان بکە لە بواری زانست و حیکمەتدا و.. لە هەمان کاتدا بۆ هەژاری و کەم دەستیی فەلسەفەش بڕوانە لە وانەکانی پەند و زانیاریی ناسینی بەدیهێنەری مەزندا.

لەبەر ئەم نهێنییەیە وا قورئانی پیرۆز (کە گەلێ ڕاستیی ڕووناك و نەبڕاوەی تێدا جەم بووە) پێویستی بە ئەندێشەی شیعر نییە. هۆیەکی تری خاوێنی و دووریی قورئان لە شیعر، بریتییە لەوەی کە هەرچەندە قورئانی پیرۆز لە تەواوترین ڕێسای دەراسا و کامڵترین ڕێکوپێکیی ئیعجازبەخشدایە و، بە شێوازە ڕەنگینەکانی خۆی تەفسیری گونجاوی خشتی و قەشەنگیی سنعەتی خواوەند لە گەردووندا دەکات، دەبینین ئەم قورئانە بە وێنەی شیعر نەهۆنراوەتەوە، چونکە هەریەك لە ئەستێرەی ئایەتەکانی قورئان خۆیان بە ڕێسای "کێش"ەوە نەبەستووەتەوە، بۆیە هەموو یەکێك لە ئایەتەکانی وەك مەڵبەند و برای زۆربەی ئایەتەکانی تر دەردەکەوێت، چونکە پەیوەندیی نێوان ئەو ئایەتانەی کە لە ناوەڕۆك و واتادا هاوپەیوەندین، بازنەیەکی فراوان دەنوێنێت، وەك بڵێی هەموو ئایەتێکی سەربەست (واتە: خۆنەبەستوو بە ڕێسای کێش)ەوە دارای گەلێ ڕوو و چاوی زۆر و زەبەندەیە و بەهۆیانەوە زۆربەی ئایەتەکانیتر دەبینێت و بۆیان دەڕوانێت.

---

(١) ئەم ڕووداوە بە واقیعی لە ئەمریکا ڕوویداوە. (دانەر)

هەر لەبەر ئەمەشە کە هەزاران "قورئان" لە ناوەندی قورئانی پیرۆزدا دەبینین! بـە ڕادەیـەك کـە بـۆ هـەموو خـاوەن مەشـرەبێك یـەکێك لـەو قورئانانـە دەبەخشـێت. بـۆ نموونـە سـوورەتی (الإخلاص) گەنجینەیەکی مەزنی ئەوتۆی زانستی تەوحیدی تێدایە کە سی و شـەش سـوورەتی ئیخلاسـی لـەخۆ گرتـووە و، لـە تێهـەڵکێش بوونـی شـەش ڕسـتە هاوپەیوەندییەکانیـەوە پێکهاتووە، وەك لە وتەی بیست و پێنجەمدا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵێ، نارێکییە ڕواڵەتییەکەی نێوان ئەسـتێرەکانی ئاسمـان وای لـە هـەموو یـەکێکی ئـەو ئەستێرانە کردووە کە سەربەست بێت و بـە هیـچ کـامی تریانـەوە نەبەسـترابێت. وەك بلێـی لـە نێـوان بازنـەی دەوروبـەری خـۆیدا مەڵبـەندی زۆربـەی ئەستێرەکان بێـت. بـەم پێیـە تاڵـە دەزووی پەیوەندی بۆ یەك بە یەکی ئەو ئەستێرانە ڕادەکێشێت، وەك ئاماژەیەك بۆ پەیوەندییـە پەنهانـەکانی نێـوان سـەرجەمی بوونـەوەران. دەڵـێی هـەموو یـەکێك لـەو ئەسـتێرانە –وەك ئەسـتێرەی ئایەتـەکانی قورئـان– خـاوەنی چـەندەها ڕووی ڕوانـەر و چـاوی بینـەرە کـە ئەستێرەکانی تریان پێ دەبینێت و ڕوویان تێ دەکات.

دەسا تۆش بۆ خۆت لە ناوەندی نـەبوونی ڕێکوپێکـیدا، کـەماڵی ڕێکوپێکـی ببینـە و پـەند وەربگرە و، لەمەشەوە نهێنییەك لە نهێنییەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە بزانە کە دەفەرموێ: ﴿**وَمـا عَلّمناهُ الشّعرَ وَما يَنبَغي لَهُ**﴾ (يس:٧٠)!

هەروەها داناییەکی تری: ﴿**وَما يَنبَغي لَهُ**﴾ لەمەی خوارەوە وەربگرە و تێ بگە:

کـاری شیعر بریتییـە لـە جوانکـردن و ڕازاندنـەوەی ڕاسـتییە بچووکـە کـپ و کـز و ونبووەکـان لـە ڕێـی ئەندێشـەی ڕازێنـەری شـاعیرەوە و، خسـتنەڕووی ئـەو ڕاسـتییانە بـە چەشنێك کە سەرنجی سەرسووڕمانی خەڵکی ڕابکێشن.. بەڵام ڕاسـتییەکانی قورئـان هێنـدە بـەرز و مـەزن و خـاوەن جازیبیـەتن کـە مـەزنترین و ڕووناکـترینی ئەندێشـەکان لـە چـاویدا کورت و کز و ناتەواو دەردەکەون!

بۆ نموونە ئەم ئایەتانە: ﴿**يَوم نَطوي السماء كَطَيِّ السِّجلِّ للكتب**﴾ (الأنبياء:١٠٤)، ﴿**يُغشـي اللّيلَ النّهارَ يَطلُبُهُ حَثيثاً**﴾ (الأعراف:٥٤)، ﴿**إنْ كانَتْ إلاّ صَيْحَةً واحِدَةً فَإذا هُمْ جَميعٌ لَدَيْنَـــا مُحْضَرون**﴾ (يـــس:٥٣) هـەروەها ڕاستییە بێ‌سنوورەکانی تـری هاوچەشـنی ئـەم ئایەتانـە لـە قورئانی پیرۆزدا، شایەتن لەسەر ئەم ڕاستییە.

ئەگەر دەتەوێت بۆخۆت ببینیت و تامی ئەوە بچێژیت کە چۆن هـەموو ئایـەتێکی قورئـانی پـیرۆز نـووری ئیعجـاز و هیدایـەتی خـۆی بـڵاو دەکاتـەوە و بـە وێنـەی ئەسـتێرەی درەخشـان تاریکستانی کوفر دەڕەوێنێتەوە، ئەوا خۆت وا دابنێ کە لەو سەردەمی جاهیلییـەت و بیابـانی

ژیانی دەشتەکی و نەزانییەدا دەژییت کە یەکەم جار قورئانی پیرۆزی تێدا هاتە خوارەوە. دەبینیت: پەردەی بێئاگایی و، تاریکیی نەزانی و، بەرگی سروشت و، بیری وشك، هەموو شتێکی داپۆشیوە. ئا لەم کاتەدا کە هەموو شتان لەو ڕۆژگارەدا بەم پەردانە داپۆشراون، یەکسەر بەهۆی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە ئەو بوونەوەرە بێهەست و بێ گیان و مردووانە لە زەینی گوێبیستاندا دەبووژێنەوە و ژیانیان بە بەردا دەچێت و بە زایەڵەی ئایەتی: ﴿يُسَبِّحُ لله ما في السَّمَـــوات وَما في الأرضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزيزِ الْحَكيم﴾ (الجمعة:١) و ئایەتە مەزنەکانی تری هاووێنەی، ڕادەپەڕن و تەسبیح و یادی خواوەند لە ڕووی بوونەوەراندا ڕادەگەیەنن.

هەروەها ڕووی تاریکی ئاسمان، کە چەند ئەستێرەیەکی بێ گیانی تێدا بڵێسە دەدەن، بە زایەڵەی ئایەتی: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَـــواتُ السَّبْعُ والأَرضُ﴾ (الإسراء:٤٤) لە بەرچاوی گوێبیستاندا دەبێت بە دەمێکی زیکرخوێن بۆ خوای گەورە و، هەموو ئەستێرەیەکی تیشکی ڕاستی دەپرژێنێت و دانستێکی ڕەوان پەخش دەکاتەوە.

هەروەها ڕووی زەوی، کە بوونەوەرە لاواز و دەستەوسانەکانی لەسەر نیشتەجێ بووە، بەو زایەڵە ئاسمانییەی قورئان، لە بەرچاودا دەبێت بە "سەر"ی جەستەی بوونەوەرێکی مەزن و، دەریا و وشکایییەکانیش دەبن بە دوو "زمان"ی دەمپاراو بە زیکر و تەسبیح و ستایشی خواوەند و، سەرجەم ڕووەك و زیندەوەرانیش وەك چەند "وشە"یەکی زیکر و تەسبیح دەردەکەون، دەڵێیت سەرجەمی زەوی گیانی بە بەردا کراوە و زیندەوەرێکی خاوەن ژیانە!

ئەگەر بێت و بەم چەشنە، بە هەست و شعووری خۆت، بڕۆیت بۆ ئەو سەردەمەی کە قورئانی پیرۆزی تێدا هاتە خوارەوە، ئەوا وردەکاریی ئیعجاز لەو ئایەتە پیرۆزەدا دەچێژیت. دەنا لە چەشتنی ئەو وردەکارییە نەرمونیانانەی ئایەتەکە بێ بەش دەبیت و پەیی پێ نابەیت!

بەڵێ، گەر لە ناوەندی باری ئێستای خۆتەوە سەیری ئایەتە پیرۆزەکان بکەیت کە بوونەوەران لەو سەردەمەوە تاکو ئێستا بە نووری قورئان ڕووناك بوونەتەوە و سەرجەم زانستە ئیسلامییەکان ڕۆشنایییان پێ بەخشیون، بە ڕادەیەك کە ڕاستییەکان بۆ هەموو کەسێك ئاشکرا بوون و پەردەیان لە ڕوودا هەڵماڵراوە.. واتە ئەگەر لە ڕێی پەردەی ئولفەتەوە سەیری ئایەتە پیرۆزەکان بکەیت، ئەوا بێ گومان مەودای ڕاستەقینەی جوانیی

ئیعجازبەخشی هەموو ئایەتێك بە تەواوی نابینیت و، نازانیت کە هەموو یەکێك لەو ئایەتانە بە ڕووناکی‌یە درەخشانەکەی خۆی چۆن تاریکایی‌یە چڕەکان دەڕەوێنێتەوە. دوای هەموو ئەمانەش لە نێوان ڕووە زۆر و زەبەندەکانی ئیعجازی قورئاندا لە چێژی هەموویان بێ بەش دەبیت.

ئەگەر دەتەوێت مەزنترین پلەی ئیعجازە زۆرەکانی قورئان ببینیت، ئەوا گوێ بۆ ئەم نموونەیە ڕابگرە و سەرنجی لێ بدە:

گریمان درەختێکی تابلێی سەیر و بەرز و سەرسووڕهێنەر و فراوان و بەربلاو هەبێت، پەردەی غەیبی بەسەردا درابێت..

وەك ئاشکرایە پەل و بەر و گەڵا و گوڵی ئەو درەختە – چەشنی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ – هاوسەنگی و گونجاوی و پەیوەندی‌یان لە نێواندا هەیە و، هەر بەشێك لە بەشەکانی ئەو درەختە بەپێی ماهییەتی درەختەکە شکڵ و شێوەیەکی دیاری کراوی گرتووەتە خۆ..

جا ئەگەر بێت و کەسێك لە لایەنی ئەو درەختە نەبینراوەوە – کە نابینرێت – هات و لەسەر شاشەیەك وێنە و سنووری بۆ هەموو یەکێ لە ئەندامەکانی ئەو درەختە کێشا، بەوەی کە چەند هێڵێکی لەسەر شاشەکە نووسی کە پەیوەندیی نێوان گەڵاکانی ئەو درەختەیان دەنواند و، بە چەند وێنە و هێڵێك کە وێنەی تەواوی ئەندامەکانی درەختەکەیان بەرجەستە دەکرد، وێنەکەیان بە تەواوی دەخستە ڕوو، ماوەی نێوان سەرەتا و کۆتایی – یەکجار لە یەکتر دووری – درەختەکەی پڕ کردەوە.. هیچ گومانێك لەوەدا نامێنێت کە ئەو وێنەکێشە بە ڕوانینی غەیب‌بینی خۆی ئەو درەختە دەبینێت و بە تەواوی ئاگای لێیەتی ئنجا وێنەکەی دەکێشێت.

وەك ئەم نموونەیە، قورئانی پیرۆزیش بە ڕوونکردنەوە ئیعجازبەخشەکانی خۆی کە تایبەتن بە ڕاستیی بوونەوەرانەوە (ئەو ڕاستی‌یەی کە سەر بە درەختی بوونەوەرانە و لە سەرەتای دنیاوە تا کۆتایی ئەودنیا لق و پەلی هاویشتووە و لە زەوی‌یەوە تا عەرش و لە گەردیلەکانەوە تا ئەستێرەکان بڵاو بووەتەوە) پارێزگاریی هاوسەنگی و لەگەڵ‌یەك گونجانی بوونەوەرانی کردووە و، وێنەیەکیشی بە هەموو یەکێ لە ئەندام و بەروبوومەکانی بەخشیوە کە شایستەی بێت، بە ڕادەیەك کە زانا لێکۆڵەرەکان لە دەمی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە و باسەکانیاندا تووشی سەرسامی و سەرسووڕمان دەبن و دەڵێن: "ما شاء الله.. بارك الله.. ئەوەی کە

گرێ کوێرەی گـەردوون و مەتـەڵی بەدیـهێنان شـی دەکاتـەوە، هـەر تەنـها تـۆی ئـەی قورئـانی پیرۆز"!

بـا ناوەکـانی خـوای گـەورە و سـیفەتە مەزنـەکانی و ئیشـە پـەروەردگاری و کـارە پـڕ لـە دانستەکانی، وەك درەختێکی تووبای نوورانی بە نموونە بهێنینەوە کە - ولله المثل الأعلـــی - بازنەی مەزنی‌یەکەی لە ئەزەلەوە تا ئەبـەد و، سنووری گەورەیی‌یەکەشـی فـەزای ڕەهـای بـێ سنوور دەگرێتە خۆی و دەورەی دەدات و، مەودای کارەکانیشی لە سنووری: ﴿فالِقُ الْحَبِّ والنَّوى﴾ (الأنعام:٩٥) و ﴿يَحولُ بينَ المرءِ وقَلْبِهِ﴾ (الأنفال:٢٤) و ﴿هـــوَ الـــذي يُصَوِّرُكُـــمْ في الأَرْحامِ كَيْفَ يَشاءُ﴾ەوە (آل عمران:٦) تا دەگاتە: ﴿خَلَقَ السَّمـــــــواتِ والأَرْضَ في ســـتَّةِ أَيّامٍ﴾(هود:٧)و ﴿والسَّمـــــواتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمينِهِ﴾ (الزمر:٦٧) و ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ والقَمَـــرَ﴾ (لقمان:٢٩) دەگرێتەوە.

دەبینین قورئانی پیرۆز، بەوپەڕی گـونجاوی و شیاوی، ئەو ڕاسـتی‌یە نوورانی‌یە بە هـەموو لق و پەلەکانی و گشت ئامانج و بەروبوومەکانیەوە ڕوون دەکاتەوە، بە ڕادەیەك کە هیچ کام لەو ڕاستی‌یانە ڕێ لە ڕوونکردنەوەی ڕاستی‌یەکی تر ناگرێت و حوکمی هیـچ ڕاستی‌یەکیان هی ئەوانی تر تێك نادات و هیچ کام لەو ڕاستی‌یانەش لەوانی تر تەرە نابێت.

بەم وێنە شایستە و پێکەوە گونجاوانە، قورئانی پیرۆز بە شـێوەیەکی ئیعجازبـەخش ڕاستیی ناوەکانی خوای گەورە و سـیفەتە مـەزن و ئیشـە پـەروەردگاری و کـارە پڕ لـە دانایی‌یـەکانی خواوەنـدی ڕوون کردووەتـەوە، بـە ڕادەیـەك کـە سـەرجەم ئـەهلی کەشـف و حەقیقـەت و دانست و عیرفانی - کـە بـە نـاو جیـهانی مەلـەکووتدا دەگـەڕێن - خستووەتە تەسـدیقەوە و، هەموویان بە سەرسووڕمانەوە لە بەردەم ڕوونکردنەوە ئیعجازبەخشەکانی‌دا دەڵێـن: "سـبحان الله! چـەندە ئـەم ڕوونـکـردنەوەیە ڕاسـتە و لەگـەڵ حەقیقـەتدا ڕێـك و گونجـاوە و، چـەندەش جوان و شایستەیە"!

ئەگەر بە نموونە "شەش پایەکانی ئیمان" بهێنینەوە کە ڕوویان لە هەموو بازنە جیاوازەکانی بوونـەوەران و بازنـەی "وجـوب"ی خـوای گـەورەیـە و، بـە پـەلێکی ئـەو دوو درەختـە مەزنـە دادەنرێن، دەبینین قورئانی پیرۆز وێنەی سەرجەم لق و پەل و بەر و گوڵەکانیان دەکێشـێت و، لەمەشـدا گونجـاویی نـاوازەی نێـوان بـەر و گوڵـەکانیان ڕەچـاو دەکـات و، بەوپـەڕی هاوسـەنگی و ڕێکـی شێوەکانی لەگەڵیـەك گونجانی نێوانیـان دەناسێنێت، بە ڕادەیـەك کـە مرۆڤ لـە بـەردەم جوانیـی ئـەم وێنـە کێشـانەی قورئـاندا سەرسام دەکات و، سـەبارەت بـە پەی‌بردن بە دووری‌یەکانیشی گرفتاری سەرسامیی دەکات.

پاشـان ئـه‌و "ئیسلام"ه‌ی كه‌ په‌لیكـه‌ لـه‌ لقـی "ئیمـان"، قورئـانی پیرۆز لـه‌ بـاس كـردن و وێنه‌كێشانی وردترین په‌له‌كانی هه‌ر پێنج پایـه‌كانی‌دا گه‌لـێ وێنـه‌ی نـاوازه‌ و سه‌رسووڕهێنی كێشاوه‌ و، جوانیی له‌گه‌ڵیه‌ك گونجان و كه‌ماڵی هاوسه‌نگیی نێوانیانی پاراستووه‌، ته‌نانه‌ت پارێزگاریی ئاسایی‌ترین داب و ئه‌وپه‌ڕی ئامانج و قووڵترین دانایی و بچووكترین سوود و به‌روبوومه‌كانی كردووه‌. ڕوونترین به‌ڵگه‌ش له‌سه‌ر ئـه‌م ڕاستی‌یه‌، كـه‌ماڵی ڕێكوپێكیـی شه‌ریعه‌تی مه‌زنه‌، كه‌ له‌ ده‌ق و ئاماژه‌ و هێماكانی ئه‌م قورئانه‌ پیرۆزه‌وه‌ هه‌ڵقوڵاوه‌.

جا كه‌ماڵی ڕێكوپێكی و.. هاوسه‌نگیی ورد و.. قه‌شه‌نگی و پته‌ویی له‌گه‌ڵیه‌ك گونجانی حوكمه‌كانی ئـه‌م شـه‌ریعه‌ته‌ خاوێنه‌.. هه‌ریه‌كه‌یان، شـایه‌تێكی دادگـه‌ری بـێ خـه‌وش و به‌ڵگه‌یه‌كی ڕوونی گومانبڕی ئه‌وتۆن كه‌ هیچ گومانێك هه‌رگیز توخنیـان ناكه‌وێت له‌سه‌ر ئه‌حه‌قیقیه‌تی قورئانی پیرۆز. واته‌ هه‌رگیز ناكرێت ڕوونكردنه‌وه‌كانی قورئـان پاڵیـان بـه‌ زانستێكی جوزئیی مرۆڤێكه‌وه‌ دابێت، به‌ تایبه‌ت مرۆڤێكی نه‌خوێنده‌وار، به‌ڵكو ده‌بێ پاڵیـان به‌ زانستێكی وه‌ها فراوانه‌وه‌ دابێـت كـه‌ هه‌موو شتێك بگرێتـه‌وه‌ و لـه‌ یـه‌ك كـاتدا چـاوی لـه‌ هه‌موو شتێكه‌وه‌ بێت..

كه‌واته‌ قورئانی پیرۆز گوفتاری زاتی خواوه‌ندی مه‌زنه‌ كه‌ له‌ یه‌ك كـاتدا ئه‌زه‌ل و ئه‌به‌د و سه‌رجه‌می ڕاستی‌یه‌كان ده‌بینێت. ئه‌وه‌ش كـه‌ ئاماژه‌ بـۆ ئـه‌م ڕاستی‌یه‌ ده‌كـات ئـه‌م ئایه‌تـه‌ پیرۆزه‌ی خواره‌وه‌یه‌ كه‌ ده‌فه‌رموێ:

﴿**الْحَمْدُ للهِ الَّذي أَنْزَلَ عَلى عَبْدِهِ الْكِتابَ وَلَمْ يَجْعَل لَهُ عِوَجاً**﴾ (الكهف: ١).

اللهم يا مُنــزل القرآن! بحق القرآن وبحق من أُنزِلَ عليه القرآن نَوِّرْ قلوبَنا وقبورَنا بنـور الإيمان والقرآن. آمين يا مستعان!!

* * *

# مەقامی دووهەمی

## وتەی سیازدەهەم

بسم الله الرحـــمن الرحیم

**(ئەمەی خوارەوە گفتوگۆیەکە لەگەڵ چەند کەسێك لەو لاوانەی کە هاندان و هەوا و ئارەزوو لە هەموو لایەکەوە کەمەندکێشیان دەکات، بەڵام هێشتا ژێری خۆیان لەدەست نەداوە).**

هەندێ کەس لە لاوان داوایان کرد "پەیامەکانی نوور" دەستی یارمەتی و فریاگوزاریان بۆ درێژبکات و، وتیان:

– بەرامبەر بەم هەموو تاقیکردنەوەی: وورووژاندن و هاندان و لەخشتەبردنەی گاڵتە و گەپ و هەوا و ئارەزووی دنیا، کە لەم ڕۆژگارەدا گەمارۆیان داوین، چۆن دەتوانین دوارۆژی خۆمان بپارێزین و ڕزگاری بکەین؟

منیش بە ناوی کەسێتیی مەعنەویی "پەیامەکانی نوور"ەوە وەڵامم دانەوە و وتم:

– "گۆڕ" لە بەرچاوی هەموو کەسێکدایە، کەس لاریی لێ نییە و، هەمووومان – بێ چەند و چۆن – دەڕۆینە ناوی! چوونەناو گۆڕیش سێ ڕێی هەیە:

*ڕێی یەکەم:* ڕێیەکە مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەوەی کە "گۆڕ" دەرگایەکە لەسەر چەندین باخچەی دڵڕفێن و جیهانی فراوانی باشتر و جوانتر لەم دنیایە، بۆ ئیمانداران، دەخرێتە سەرپشت.

*ڕێی دووهەم:* ڕێیەکە مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەوەی کە "گۆڕ" دەرگای بەندیخانەیەکی بەردەوامە بۆ ئەوانەی کە هەرچەندە باوەڕدارن بە دوارۆژ، بەڵام لە گومڕایی و خراپکاریدا ڕۆچوون و پێیان لێ ڕاکێشاوە. ئەوانە بیروباوەڕیان بەرامبەر بە "بوون" و "ژیان" چۆن بووە، هەر بەو چەشنە مامەڵەشیان لەگەڵدا دەکرێت، کەواتە بەو پێیە و لەبەر ئەوەی بە داخوازیی باوەڕەکەیان (کە بە دوارۆژ بوویانە) ڕەفتاریان نەکردووە، ئەوا لە بەندیخانەی تاکە کەسیدا بەند دەکرێن و لە هەموو خۆشەویستانیان دوور دەخرێنەوە و دادەبڕرێن.

*ڕێی سێهەم:* ڕێیەکە ئەو گومڕایانە دەیگرنەبەر کە باوەڕیان بە دوارۆژ نییە. دەبینن "گۆڕ" دەرگایەکە بەرەو ڕووی "نەبوون" و لەناوچوونێکی یەکجارەکی کراوەتەوە. "گۆڕ"

- لە بەرچاوی ئەو كەسەدا - قەنارەیەكە خۆی و هەموو خۆشەویستانی لەناودەبات. ئەمە پاداشتی باوەڕنەكردنیەتی بە دوارۆژ.

ئەم دوو بەشەیان ئاشكران و بە چاو دەبینرێن و پێویستیان بە هێنانەوەی بەڵگە نییە. چونكە مادەم "ئەجەل" بە پەردەی پەنهانی غەیب داپۆشراوە و، "مردن"یش هەموو دەمێك دەتوانێت پێمان بگات و بەسەرمان بكات و، بێ جیاوازی كردن لە نێوان پیر و لاودا بەردەوام لە ئەستۆی مرۆڤ دەدات و ملی دەپەڕێنێت، ئەوا مرۆڤ كە بوونەوەرێكی لاوازە، هەمیشە ئەم كێشە و مەسەلە سامناكەی لە بەرچاودایە و دەیبینێت و، بێ هیچ گومانێكیش بە دوای شتێكدا دەگەڕێت كە لەو پەتی قەنارەیە ڕزگاری بكات و دەرگای تاریكی گۆڕی بۆ بگۆڕێت بە نوورێكی پرشنگداری ئەوتۆ كە بەسەر جیهانێكی نەمر و چەندین باخچەی پڕ لە گوڵزار، لە جیهانی نوور و بەختەوەریی هەمیشەییدا، بكرێتەوە. بێ گومان ئەم مەسەلەیە مەزنترین كێشەی مرۆڤە، تەنانەت لە هەموو دنیا گەورەتر و مەزنترە.

دەركەوتنی ئەم ڕاستییە - ڕاستیی مردن و گۆڕ - بەم سێ ڕێگایەی باسمان كردن، سەد و بیست و چوار هەزار لە هەواڵدەرە ڕاستگۆكان ڕایدەگەیەنن، كە پێغەمبەرانی نازدارن - درووديان لەسەر بێت - و ئالای تەسدیقی خۆیشیان هەڵكردووە، كە موعجیزەكانیانە.. هەروەها سەد و بیست و چوار ملیۆن لە ئەولیا و پیاوچاكان ئەم هەواڵە دەدەن و تەسدیقی هەواڵی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزانە دەكەن و دەیسەلمێنن و لە ڕێی چێژ و بینینی تایبەتیی خۆیانەوە شایەتی لەسەر ئەو ڕاستییە دەدەن. هەروەها چەندەها زانای خاوەن لێكۆڵینەوەی لەژمارەبەدەریش، ئەم هەواڵە ڕادەگەیەنن و بە بەڵگە عەقڵی و گومانبڕەكانیان - كە دەگەنە پلەی "علم الیقین" - ئەو هەواڵەی پێغەمبەران و پیاوچاكان بە: لە سەدا نەوەدونۆی پلەكانی چەسپاندن، دەچەسپێنن[1] ئەوەتا هەموویان بڕیار دەدەن و دەڵێن:

"ڕزگاربوون لە ئیعدامی هەتاهەتایی و، دەربازبوون لە بەندیخانەی تاكەكەسی و، گۆڕینی مردن بە بەختەوەریی هەمیشەیی، تەنها بە ئیمان و گوێڕایەڵیی خوای گەورە دەبێت".

بەڵێ، ئەگەر كەسێ ڕێگایەك بگرێتەبەر و گوێ بە قسەی هەواڵدەرێك نەدات كە هەواڵی بداتێ مەترسییەكی سامناك لەو ڕێیەدا هەیە، با ڕێژەی هاتنەدیی ئەو مەترسییەش لە سەدا یەك بێت، ئایا ئەو دڵەتەپێیەی كە لە چاوەڕوانی كردنی ئەو مەترسییەوە سەری تێدەكات سەروزیادی ئەوە نییە كە خەو و خۆراكی لەلا ببێزرێ؟ خۆ ئەم هەواڵەی ئێمە لێی دەدوێین هەواڵێكە سەدان هەزار ڕاستگۆی تەسدیق كراو كە لە سەدا سەد ڕاست دەكەن،

(١) یەكێك لەو زانایانە - وەك هەموان دەیبینن - پەیامەكانی نوورە. (دانەر)

ڕایدەگەیەنن و هەموو بە یەك دەنگ دەڵێن: گومڕایی و سەرسەختی، مرۆڤ دەگەیەننە سێدارە و بەندیخانەی تاکەکەسیی هەمیشەیی گۆڕ، وەك لە بەرچاودایە. ئیمان و خواپەرستیش، بە دڵنیایی‌یەکی سەد لە سەد، دارەکانی سێدارە لەسەر ڕێی مرۆڤ لادەدەن و دەرگای بەندیخانەی تاکەکەسییش دادەخەن و گۆڕیش دەکەن بە دەرگایەك کە بەسەر ڕووی چەندین کۆشك و تەلاری ڕازاوە و ئاوەدان بە بەختەوەریی هەمیشەیی و پڕ لە چەندین گەنجینەی پڕاوپڕ و نەبڕاوە، دەکرێتەوە. ئەوەش بزانە کە ئەوان لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئەم هەواڵەدا بەڵگەکانیشیان دەستنیشان دەکەن و شوێنەوارەکانیشی دەردەخەن.

ئێستا ئەم پرسیارەتان ئاراستە دەکەم:

ئایا هەڵوێستی مرۆڤی هەژاری بێ‌نەوا، بە تایبەتی موسڵمان، بەرامبەر بەم مەسەلە مەزن و سامناکە چی‌یە؟ ئەگەر مرۆڤێ لە ئیمان و خواپەرستی بێ‌بەش بێت ئایا هەموو دەستەڵاتداریی دنیا، بە هەموو خۆشی و تامێکیەوە، دەتوانێت دڵەتەپێ و نیگەرانیی ئەو لاببات کە هەموو چرکەیەك چاوەڕێی نۆرەی خۆیەتی تاکو بڕواتە ناو گۆڕەکەیەوە؟

ئنجا پیری و نەخۆشی و بەڵا و موسیبەت و مردنی ئەم و ئەو لەم لا و لەو لادا، هەموو ئەمانە، دڵۆپ دڵۆپ ئەو ئازارە دەچۆڕێننە ناو دەروونی هەموو مرۆڤێکەوە و، هەمیشە بە چارەنووسە بێ‌گومانەکەی هەڕەشەی لێ دەکەن. بێ هیچ گومانێك دۆزەخێکی مەعنەوی لەناو دڵی ئەو گومڕا و نەفامانەدا دادەگیرسێت و بە بڵێسەکەی هەڵیاندەقرچێنێت، با لە ڕواڵەتیشدا تام و لەزەتی خۆشی و جوانیی دنیا بچێژن. تەنها "بێ‌ئاگایی"یە کە مەستی کردوون و نایەڵێ هەست بەو ئازارە بەسوێیە بکەن.

جا مادەم ئیمانداران و گوێڕایەڵانی خوای گەورە، ئەو گۆڕەی بەرچاویان بە دەرگایەك دەبینن کە لە ڕووی چەندین باخچەی بەختەوەری و ناز و نیعمەتی هەمیشەیی‌دا دەکرێتەوە، بەهۆی ئەو بڕوانامەیەی کە چەندین گەنجینەی نەبڕاوەیان دەست دەخات و قەدەری خواوەند - بە شایەتیی ئیمان - پێی بەخشیون.. مادەم ئیمانداران و گوێڕایەڵان بەو چەشنە دەڕواننە گۆڕ، ئەوا هەموو یەکێکی ئەوان لە هەموو چرکەیەکی ژیانی‌دا هەست بە لەزەتێکی ڕاستەقینە و چێژێکی ڕۆحیی قووڵ دەکات و، چاوەڕوانە یەکێك بانگی بکات و پێی بڵێت: "وەرە بلیتەکەت وەربگرە".. ئەو چێژە ڕۆحی‌یە بە چەشنێکە گەر بەرجەستە ببێت، وەك بەهەشتێکی مەعنەویی لێ دێت بۆ ئەو ئیماندارە، بە چەشنی "تۆو" کە شێوەکەی دەگۆڕێت و دەبێت بە درەختێکی بەرجەستەی مەزن.

مادەم وایە، ئەوا ئەو کەسەی بە هاندانی هەڵەشەیی و نەفامیی لاوی و، لەبەر لەزەتێکی کاتی و ناڕەوای ئاوێتەی ئازار و هاوچەشنی هەنگوینی ژەهراوی، واز لەو تام و چێژە

ڕۆحی‌یە بێ گەردە دەهێنێت، ئەوا دادەبەزێتە ئاستێکی گەلێ نزمتر لە هی ئاژەڵ، بگرە ناشتوانێت بگاتە ئاستی مولحیدانی بیانی و وەك ئەوان وابێت، چونکە گەر یەکێك لەوان باوەڕی بە پێغەمبەری ئازیزمان نەبێت ﷺ لەوانەیە باوەڕی بە پێغەمبەرانی تر ببێت. خۆ ئەگەر باوەڕی بە هەموو پێغەمبەران نەبێت، لەوانەیە باوەڕی بە خوای گەورە ببێت. گەر ئیمانی بە خوایش نەبێ، لەوانەیە دارای ئەوەندە ڕەوشتی جوان و بەرز بێت کە کەمالاتی مرۆڤانەی پیشان بدەن. بەلاّم موسڵمان تەنها بەهۆی ئەم پێغەمبەرە ئازیزەوە ﷺ پێغەمبەرە بەڕێزەکانی تری ناسیوە و باوەڕی بە خوا هێناوە و کەمالاتی مرۆڤانەی زانیوە. کەواتە هەر موسڵمانێك واز لە پەروەردەی پیرۆزی ئەو بهێنێت و گوێڕایەڵیی نەکات، ئەوا دان بە هیچ پێغەمبەرێکی تردا نانێت، بەڵکو لەوانەیە ئینکاریی خوای گەورەیش بکات و، ناشتوانێت پارێزگاریی بناغەکانی کەمالاتی مرۆڤانە لە ڕۆحی خۆیدا بکات، چونکە ڕەگ و بنچینەکانی ئەو ئایینە و بناغەکانی ئەو پەروەردەیەی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ هێناویەتی، ئەوەندە تەواو و چەسپاو و ڕەگداکوتاون کە هەر کەسێ پشتیان تێ بکات و وازیان لێ بهێنێت هەرگیز ڕوونـاکی و کەمالی مرۆڤانەی دەست ناکەوێت، بەڵکو بڕیاری نوشوستیی یەکجارەکیی لەسەر دەردەکرێت، چونکە ئەم پێغەمبەرە ﷺ سەردار و دواهەمینی هەموو پێغەمبەرانە و پێشەوای هەموو گرۆی مرۆڤایەتی‌یە لە هەموو ڕاستی‌یەکاندا، بەڵکو مایەی شانازیی هەموویانە، وەك لە ماوەی چواردە سەدەی ڕەبەقدا بە جوانی ئەمەی چەسپاندووە.

کەواتە ئەی ئەو کەسانەی کە خۆشی و لەزەت و جوانیی دنیا لە خشتەی بردوون! ئەی ئەوانەی هەموو تەقالایەکیان بۆ دابین کردنی ژیان و پاشەڕۆژی دنیایانە و خەمی بۆ دەخۆن! بەدبەختینە! ئەگەر دەتانەوێت لەزەت لە چێژ و نیعمەتی بەختەوەری و حەوانەوەی دنیا وەربگرن، ئەوا تام و چێژە حەلاڵەکان سەروزیادی هەموو شتێکتانە و بەدەم هەموو ئارەزوویەکتانەوە دەڕوات و بۆتانی دابین دەکات.

لەمەوە کە ئێستا باسمان کرد، بۆتان دەرکەوت کە هەر تام و لەزەتێکی دەرەوەی بازنەی شەرع، هەزار و یەك ئازاری تێدایە، چونکە وەك ئەوەی کە دەکرێت ئێستا ڕووداوەکانی ڕابوردوو لەسەر شاشەیەك پیشان بدرێن، گەر بەو جۆرەیش بتوانرایە ڕووداوەکانی داهاتووی (با بڵێین پاش پەنجا ساڵی تر) لەسەر شاشەیەك پیشان بدرێن، ئەوا سەر لێ شێواوان و بێ ئاگایان تا دەیانتوانی بەکوڵ بۆ ئەو شتانە دەگریان کە ئێستا مایەی پێکەنینیانە!

کەواتە ئەو کەسەی کە دڵخۆشی و کامەرانیی بێگەرد و هەمیشەیی دنیا و قیامەتی دەوێت، با چاو لەو پەروەردەیەی پێغەمبەر ﷺ بکات، کە لە ئیماندا هەیە.

## چەند پەند و ڕێنمایی و ئامۆژگارییەك

## بۆ كۆمەڵە لاوێكی هەژار

ڕۆژێکیان کۆمەڵێك لاوی جوانخاس و وریا و زیرەك هاتن بۆ لام و، داوای چەند ڕێنمایی و بێدارکردنەوەیەکی بەهێز و باشی وایان لێ کردم کە بیانپارێزێت لە پزیسکی شەڕ و ئاژاوەی داخوازییەکانی ژیان و هەرەتی لاوی و هەوا و ئارەزووی دەوروبەریان.

منیش هەر بەو جۆرە وەڵامەی کە دامەوە بۆ ئەوانەی داوای یارمەتییان لە پەیامەکانی نوور کرد، وەڵامی ئەم لاوانەیشم وا دایەوە و وتم:

– باش بزانن ئەم بەهاری تەمەن و جوانییەی ژیانتان کە ئێستا لەزەتی لێ دەبینن، بێ هیچ گومانێك دەڕوات و نامێنێت. جا ئەگەر خۆتان لە چوارچێوەی سنوورەکانی شەرعدا نەهێڵنەوە و لەو سنوورانە دەربچن، ئەوا لاوییەکەتان زایە دەبێت و بە خۆڕایی لەکیستان دەچێت و، چ لە دنیا و چ لە گۆڕ و چ لە قیامەتدا ئەوەندە گیروگرفتتان دەهێنێتە ڕێ کە لەو تام و لەزەتەی لاوی و تەمەنی دنیاتان گەلێ زۆر و زیاتر بێت. بەڵام ئەگەر بەهاری لاویتان لە: دەروونپاکی و پارێزگاریی شەرەف و گوێڕایەڵیی خوادا بردە سەر، بەوەی کە خۆتان بە پەروەردەی ئیسلام بێ گەیاند و بەمەش شوکرانەی ئەو نیعمەتی لاوی و گەنجییەتان دەربڕی کە خواوەند پێی بەخشیون، ئەوا لە مەعنا و ناوەڕۆکدا، ئەو سەردەمی لاوییەتان دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت و، دەبێت بە هۆیەك بۆ دەستکەوتنی لاوییەکی هەمیشەیی لە بەهەشتی نەمری و هەتاهەتاییدا.

"ژیان" گەر لە "ئیمان" بەتاڵ بێت، یان بەهۆی زۆریی گوناهباری و سەرپێچی کردنەوە لە فەرمانەکانی خوای گەورە، کاریگەریی ئیمانی تێدا نەمابێت، ئەوا لەگەڵ تام و لەزەتە ڕواڵەتی و کەم خایەن و کورتەکانیدا، چەندین ئەوەندەی ئەو تام و لەزەتانە خەم و خەفەت و ئازار دەرخواردی مرۆڤ دەدات.

چونکە لەبەر ئەوەی مرۆڤ عەقڵ و بیری دراوەتێ، ئەوا پەیوەندییەکی سروشتیی بەتینی لەگەڵ ڕابوردوو و داهاتوویدا هەیە، سەرەڕای کاتی ئێستای. ئەم پەیوەندییەی لەگەڵ ئەو

كاتانەدا هێندە بەتینە كە دەتوانێت تامی لەزەتەكانی ئەو سەردەمانە و ئازارەكانیان بچێژێت، بە پێچەوانەی ئاژەڵ كە خەم و پەژارەكانی ڕابوردوو و مەترسییە چاوەڕوان كراوەكانی داهاتوویش، لەزەتەكانی كاتی ئێستای لێ ناشێوێنن و تێكی نادەن، چونكە بیر كردنەوەی نەدراوەتێ.

لەبەر ئەوەیە كە ئەو كەسەی بەرەو شێوی "گومڕایی" بەربووەتەوە و، "بێ ئاگایی"ش بە تەواوی هەر شەشدەری لێ گرتووە، خەفەتەكانی بۆ كاتەكانی ڕابوردووی و دڵەتەپێ و نیگەرانییەكانیشی بۆ دواڕۆژی، تامی لەزەتەكانی ئێستای ناهێڵن و ژیانی بە خەم و ئازار و خەیاڵ لێ دەشێوێنن، بە تایبەت لەزەتە ناڕەواكان كە وەك هەنگوینی ژەهراوی وان.

واتە لە ڕووی چەشتنی تام و لەزەتەكانی ژیانی دنیاوە، مرۆڤ سەد پلە لە خوار ئاژەڵەوەیە، تەنانەت "ژیان" و "بوون" و "جیهان"ی گومڕا و بێ ئاگایان تەنها ئەمڕۆ و كاتی ئێستایانە. چونكە كاتە بەسەرچووەكان و هەرچییەكیان تێدایە، بە حوكمی گومڕاییەكەیان، "نەبوو" و "مردوو"ن، ئیتر لەوێوە هەموو جۆرە تاریكییەكیان ئاراستە دەكرێت و تیایدا دەتلێنەوە.. كاتەكانی داهاتوویش سەبارەت بەوان، بەهەمان جۆر، شتانێكی "نەبوو"ن، چونكە ئەوان باوەڕیان بە "غەیب" نییە، كەواتە ئەو جوداییە هەمیشەییانەی كە تەواو نابن و لەبن نایەن، ژیانی ئەوانە بە چەندین تاریكیی ڕەش پڕ دەكات، مادەم دارای عەقڵ و ژیری بن و لەگەڵ ئەوەشدا ئینكاریی حەشر و زیندووبوونەوە بكەن.

بەڵام ئەگەر "ئیمان" ببێت بە "ژیان"ی ژیان و تیشكی خۆی بهاوێتە ناو ژیانەوە، ئەوا هەموو كاتەكانی ڕابوردوو و داهاتوو ڕووناك دەبنەوە و "مانەوە"یان دەست دەكەوێت و لە گۆشەی ئیمانەوە، چەندین تام و چێژی مەعنەوی و بەرز و ڕووناكی "بوون" و "مانەوە" بە "دڵ" و "گیان"ی مرۆڤی ئیماندار دەبەخشن.

ئەم ڕاستییە، لە ئومێدی حەوتەمی "پەیامی پیران"دا بە تەواوی ڕوون كراوەتەوە، با سەیر بكرێت . ژیان ئاوایە.. جا ئەگەر دەتانەوێت تامی ژیان بچێژن، ئەوا ژیانتان بە "ئیمان" بژیێنن و، بە ئەنجامدانی فەرزەكان بیڕازێننەوە و، بە دوورەپەرێزیشتان لە سەرپێچیی فەرمانەكانی خواوەند پارێزگاریی بكەن.

ڕاستیی ئەو "مردنە"ش كە هەرچی ڕۆژە مردووان لە هەموو شوێنێكدا سامناكی و مەترسییەكانیمان پیشان دەدەن، وا لە نموونەیەكدا ڕوونی دەكەمەوە، هەروەك بۆ چەند لاوێكی تری وەك ئێوەم ڕوون كردەوە:

وا دابنێین لێرەدا چەندین سێدارە دانراون و لە تەنیشتی ئەو سێدارانەشەوە فەرمانگەیەك هەیە بەخششی زۆر و گەورە گەورەی تێدا دابەش دەکرێت بەسەر بەختەوەراندا. ئێمەش کە دە دانە کەسین لێرەدا، بمانەوێت و نەمانەوێت، بۆ ئەوێ بانگ دەکرێین. بەڵام لەبەر ئەوەی کاتی بانگ کردنمان نازانین، ئەوا هەموو خولەکێك چاوەڕێین پێمان بڵێن: "وەرە بڕیاری لەسێدارەدانت وەربگرە و بە سێدارەکەتدا سەربکەوە"! یان بڵێن: "وەرە ئەو بلیتە وەربگرە کە بۆت دەرچووە و ملیۆنەها لیرەی زێڕینی لێ قازانج دەکەیت!

لەم کاتەدا کە ئێمە ڕاوەستاوین و لە چاوەڕوانی‌داین، لای دەرگاکەوە دوو کەس پەیدا بوون و هاتنە ژوورەوە:

یەکێکیان: ئافرەتێکی جوانی نیمچەڕووتی گاڵتەچی‌یە، پارچەیەك شیرینیی بە دەستەوە گرتووە و پێشکەشمانی دەکات و بە ڕواڵەت لەوە دەچێ خۆش و بەتام بێت، بەڵام لە ڕاستی‌دا ژەهراوی‌یە..

ئەوی تریان: پیاوێکی بەویقاری وریایە، نە فێڵبازە و نە ئەوەندەش بێ‌تەجروبەیە کە بخەڵەتێت، لە دوای ئەو ئافرەتەوە هاتە ژوورەوە و وتی: من "نهێنی"یەکی سەیر و وانەیەکی پڕ لە پەندم بۆ هێناون. ئەگەر ئەم وانەیە بخوێنن و لەو شیرینی‌یە نەخۆن، ئەوا لەو قەنارە و سێدارانە ڕزگارتان دەبێت و بەم "نهێنی"یەش بلیتی ئەو بەخشش و خەڵاتە بەنرخەتان دەست دەکەوێت. ئەوەتا ئێوە بە چاوی خۆتان دەبینن کە هەر کەسێك لەو شیرینی‌یە بخوات تا دەگاتە لای قەنارەکەی سکی پێچ دەخوات و بە سکێشەوە دەتلێتەوە.

ئەوانەش کە بلیتەکەیان بۆ دەرچووە، هەرچەند لە ئێمەوە دیار نین و بە ڕواڵەت لەوە دەچێت کە بە قەنارەکاندا سەرکەوتبن، بەڵام زیاتر لە ملیۆنەها شایەت هەواڵمان دەدەنێ کە ئەوانە لە سێدارە نەدراون، بەڵکو داری سێدارەکانیان کردووە بە پلیکانە و بە ئاسانی پیایاندا سەرکەوتوون و لەوێوە ڕۆشتوون بۆ ئەو فەرمانگەیەی کە بەخششەکانی تێدا دابەش دەکرێت.

فەرموون لە پەنجەرەکانەوە بڕوانن، با بە چاوی خۆتان ببینن کە چۆن گەورە لێپرسراوان و سەرپەرشتیارانی دابەشکردنی ئەو بەخششانە پڕ بە دەم دەڵێن:

(بەوپەڕی دڵنیایی‌یەوە بزانن کە خاوەنانی ئەو "نهێنی"یە سەیر و سەرسووڕهێنەرە، بلیتەکەیان بۆ دەرچووە. هەروەك بە "عین الیقین" و بێ گومانی ئەوانەتان بینی کە بە سێدارەکاندا سەرکەوتن، هیچ گومانێکیشتان لەمەدا نەبێت، چونکە وەك خۆری ناوجەرگەی ئاسمان شتێکی ئاشکرا و ڕوونە).

بەم جۆرە و بە چەشنی ئەم نموونەیە:

تـام و لـەزەتـە حـەرام و نارەوا كـانی "لاوی" وەك هـەنگوینی ژەهـراوی وان! مردنیـش لای ئەوانـەی كـە بلیتـی ئیمانیـان ون كـردووە - ئـەو بلیتـەی كـە بەختـەوەریی هەمیشـەیی بـۆ خاوەنەكەی دەباتەوە - وەك سێدارە وایە و، ئەوانە هەمیشە چاوەڕوانی جـەلـلادی "مـردن"ن، كە لەبەر نەزانراویی كاتەكەی دەگوێچێ هەموو چاوترووكاندنێك ئامـادە بێـت، تـاكو بـە بێ جیاوازی كردن لە نێوان پیر و لاودا ملان بپەڕێنێت و بیانخاتە ناو چاڵی گۆڕەوە، ئەو گـۆڕەی كە بە ڕواڵەت دەرگای تاریكیی هەمیشەیی‌یە.

بەڵام ئەگەر لاو پشـتی لەو تام و لەزەتـە حـەرامە هـەڵكرد كـە وەك هـەنگوینی ژەهـراوی وایە و، هـەوڵی دا ئـەو "نـهێنی"یـە قورئانی‌یـەی دەسـت بكـەوێت كـە بریتی‌یـە لـە ئیمـان و بەجێـهێنانی فـەرزەكان، ئـەوا سـەد و بیسـت و چـوار هـەزار پێغەمبـەر - علیـهم السـلام - و گەلـێ ئـەولیا و پیاوچـاك و زانـای خواناسی لەژمارەبەدەر، بە یـەكدەنگ و بـە پیشـاندانی شوێنەواری هەواڵ و مژدەكەیان، مژدەی دەدەنێ كە: ئیمـاندار بلیتێكـی وای بـۆ دەردەچێـت "بەختەوەریی هەمیشەیی" دەست بخات.

**پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە كە:**

بێ هیچ گومانێك قۆناغی "لاوی" دەڕوات و نامێنێت. جا ئەگـەر لە پێناوی قۆزتنـەوەی تام و لـەزەت و كـەیف و شادیی هەڵەشەیی و لەخۆباییبووندا بەسـەرچوو بێت، ئـەوا هـەزاران بەڵا و ئازاری پڕ ئێش بۆ ئەو مرۆڤە بەجێ دەهێڵێت، چ لە دنیا و چ لە قیامەتدا.

ئەگەر دەتانەوێت تێ بگەن لەوەی كە ئەم حاڵەتەی ئەو جۆرە لاوانەی تێدان زۆربەی جـار دەیانگەیەنێتە خەستەخانەكان، لەبەر هەڵسوكەوتی هەڵەشـە و زیـادەڕەوی و تووشبوونیانەوە بە چەندین نەخۆشیی دەروونی..

یان گەر دەتانەوێت بزانن ئەو چەشنە حاڵە دەیانگەیەنێتە بەندیخانـەكان و ئـەو مەڵبەندانـەی كـە بـە چـاوی سـووك سـەیری مرۆڤـی تێـدا دەكرێـت، بـەهۆی شـوێنكەوتنی هـەوا و ئارەزووەكانیـان و باییبوونیانـەوە لـە خۆیـان.. یـان بـۆ مەلـهـا و مەیخانـەكان، بـەهۆی ئـەو دڵتەنگی و دەروون تەسكی‌یەی كە لە ئەنجامی دڵتەپێ و ئازارە مەعنەوی و دەروونی‌یەكانەوە دووچاری دەبن..

بەڵێ، گەر دەتانەوێت لەم ئەنجامانە دڵنیا بـبن، ئـەوا پرسیار لـە خەستەخانە و بەندیخانە و گۆڕستانەكان بكـەن. گـەر پرسیارتان كـرد، ئـەوا بـێ هیـچ گومـانێك لەسـەر زمـانی حـاڵی

خەستەخانـەکانەوە گوێتـان لـە ئـاخ و داخـی چـەندین نەخۆشـیی وەهـا دەبێـت کـە لـە ئارەزووبازی و زیادەڕەویی لاوانەوە پەیدا بوون.. هەروەها لە بەندیخانەکانیشـەوە ئاهو ناڵـەی خەم و دەنگی پەشیمانی و هەنسکی حەسرەتی ئەو لاوانە دەبیستن کە لە خۆیـان بـایی بـوون و ڕەفتاری هەڵەشانەیان دەنوانـد، کـەچی وا ئێستا لـە ئـەنجامی گوێڕایـەڵی نـەکردن و سنوور شکاندنی فەرمانەکانی شەرعەوە، زللەی تەمێ کردنیان لـێ دەدرێت. دیارە ئەو کاتەش بۆتـان دەردەکـەوێت کـە زۆربـەی ئـەو شتانەی مایـەی ئـازاری گـۆڕن - کـە جیـهانێکی بـەرزەخیی ئەوتۆیە لەبەر زۆریی ئەوانەی تێی دەچن دەرگاکـانی بـەردەوام لـە کردنـەوە و داخستندان! - هەڵسوکەوتە هەڵە و خراپەکانن کـە ئـەو مرۆڤـە لـە سـاڵانی تەمـەنی "لاوی"دا ئـەنجامی داون، وەك بـە بینینـی ئەوانـەی گۆڕیـان بـۆ کەشـف دەبێـت و بـە شـایەتیی هـەموو زانایـان و ئـەهلی حەقیقەت، چەسپاوە.

یـان گـەر حـەز دەکـەن ئەمـەتان زیـاتر بـۆ ڕوون ببێتـەوە فـەرموون پرسـیار لـە "پـیران" و "بیماران" بکەن کە زۆرینەی چین و توێژەکانی ئادەمیزادن. خۆ گـەر پرسیاریان لـێ بکـەن، ئەوا لە زۆربەی ئەوانەوە دەبیستن، کە دەڵێن:

(زۆر بەداخەوەین بۆ ئەو تەمەنەی لە دەستمان دەرچوو! بەهاری لاویمان لـە چـەندین شتی بێنرخ و تەنانـەت زیانبەخشـدا بەزایـە دا. هـەرگیز چـاو لـە ئێمـە نەکـەن و شـوێن پێمـان هەڵنەگرن)! چونکە ئەو کەسەی کە لـە پێنـاوی ئـەوەی پێنج یـان دە سـاڵی تەمـەنی لاویی بـە چـەند چێژێکی حـەرام بباتە سـەر، سـاڵەهای سـاڵی ژیـانی دنیـای بـە خـەم و خـەفـەت لـێ بڕوات و، پاشان لە دۆزەخیشدا سزا بچێژێت.. ئەو کەسە، شایانی بەزەیی پێدا هاتنەوە نی‌یە، هەرچـەندەش لـە حـاڵێکی ئـەوەندە سـەختدایە کـە لـە هـەموو کەسێك زیـاتر بـەزەیی مـرۆڤ دەبزوێنێت، چونکە ئەگەر کەسێك بە ڕەزامەندیی خۆی زیانی بۆ خـۆی هـەڵبژارد و زەرەری خۆی پێ خۆش بوو، شایستەی ئەوە نی‌یە مرۆڤ بەزەیی پێدا بێتەوە و بە چاوی میهرەبانی‌یەوە بۆی بڕوانێت، بەپێی ئەو دەستوورە دانست بەخشەی کە دەڵێت: "الراضي بالضرر لا يُنظـــر له".

لە خوا داواکارم ئێمە و ئێوەش لە فیتنە و ئاشووب و ئـاژاوەی لەخشـتەبەری ئـەم کـات و سەردەمە بپارێزێت و، لە شەڕ و خراپکاری ڕزگارمان بکات. ئامین.

* * *

## پەراوێزی مەقامی دووهەمی وتەی سیازدەهەم[1]

باسمه سبحانه

بەندکراوان گەلێ پێویستیان بەو دڵنەواییەیە ڕاستەقینە و دڵدانەوە پاك و بێ گەردەیە کە لە "پەیامەکانی نوور"دا هەن. بە تایبەت ئەو لاوانەی کە بە دەستی هەوا و ئارەزووی خۆیان زللەی تەمێ کردن و سەرزەنشتیان چەشتووە و، هەرەتی جوانیی تەمەنیان لە بەندیخانەکاندا بەسەر بردووە، ئەوانە چەندە پێویستیان بە "نان"ە هێندەش پێویستیان بە "نوور"ە.

دەماری لاو هەردەم بۆ هەوا و ئارەزووی هەستەکانی لێدەدات و بەدەم ئەو هەستانەوە زیاتر دەڕوات و پتر گوێڕایەڵیان دەبێت تاکو عەقڵ و ژیری! ئاشکرایشە هەوا و ئارەزوو لە دەمی قولپدان و هەڵچوونیدا درەمێك لەزەتی ئێستای بەلاوە باشترە لەچاو یەك تەن(طـــن) تام و لەزەتی داهاتوو. دەبینیت بەهۆی هاندەری هەوا و ئارەزووی تام و لەزەتی یەك خولەکی "تۆڵە سەندنەوە" لاوێك دەچێت مرۆڤێکی بێتاوان دەکوژێت و، لە ئەنجامی ئەم کارەشیدا هەشت هەزار کاتژمێری تەمەنی بە ئەشکەنجەی بەندیخانەوە دەتلێتەوە.. هەروەها "لاو" جڵەوی خۆی بۆ تام و لەزەتی سەعاتێکی ڕابواردن لە "مەسەلەی شەرەف"دا شل دەکات، پاشان لە ئەنجامی ئەمەدا ئازاری هەزاران ڕۆژی بەندیخانە و ترسان لە دوژمنەکەی دەچێژێت. بەم جۆرە، بەختەوەریی تەمەنی ئەم لاوە لە نێوان دڵەتەپێ و نیگەرانی و ترس و لەرز و ئازاردا بە زایە دەچێت.

بەم جۆرە، لاوانی هەژار دەکەونە ناو چەندین گیروگرفتی سەختی زۆری وەك ئەمانەی باس کران. بە ڕادەیەك کە خۆشترین و شیرینترین ڕۆژگارانی ژیانیان لێ دەبێت بە سەختترین و تاڵترین و، دەکەونە بارێکی هێندە ناهەموارەوە کە مرۆڤ بەزەیی پێیاندا بێتەوە، بە تایبەت دوای ئەوەی کە چەندین گێژەڵووکەی لار و چەوت لە باکوورەوە هەڵیان کرد و چەندەها ئاشووبی کاولکاریان لەگەڵ خۆیاندا بۆ ئەم چەرخەی ئێستامان هێنا، چونکە شەرەف و نامووسی ئافرەتان و کچانی جوان بۆ هەوا و ئارەزووی دواڕۆژ نەبینی لاوان موباح دەکەن و، بۆ تێکەڵیی بێئابڕوانە هانیان دەدەن. سەرەڕای ئەوەش، سەروەت و سامانی دەوڵەمەندان بۆ چەند هەژارێکی هەرزە و نەفام بە حەڵاڵ دادەنێن.

---

(١) ئەم پەراوێزە چەند نامەیەکە مامۆستا نوورسی لە بەندیخانەدا ئاراستەی بەندکراوانی کردوون. (وەرگێڕ)

جەستەی هەموو مرۆڤایەتی لە بەردەم ئەم هەموو تاوانە ناڕەوایانەی لە دژی دەکرێن، تەزووی پێدا دێت!

لاوانی موسڵمانی ئەم چەرخە پڕ لە تەنگانە و دەردیسەرییە، دەبێ چاکی لێبڕان بکەن بە لادا و قۆڵی مەردانەی لێ هەڵبماڵن، تاکو ئەم هەڵوێستە ڕزگار بکەن و، شمشێرە ئەڵماسییەکانی "پەیامەکانی نوور" و بەڵگە گومانبڕەکانی (کە لە پەیامی: بەری درەختی ئیمان و، ڕابەری لاوان و، هاوچەشنیاندان) بە دەستەوە بگرن و بەرگری لە خۆیان بکەن و بەرەنگاری ئەو هێرشە ڕامالەرە ببنەوە کە لە دوو قۆڵەوە دەکرێتە سەریان. دەنا پاشەڕۆژی لاوانی جیهان و بەختەوەریی ژیانیان تیادەچێت و، خۆش گوزەرانیی دواڕۆژیشیان نامێنێت و، هەموو ئەمانەیان لێ دەبێت بە ئەشکەنجە و ئازار، چونکە لە ئەنجامی زیادەڕەوی و بەدکرداریياندا لە خەستەخانەکاندا دەکەون و، بەهۆی هەڵەشەیی و سەرەڕۆییشەوە لە بەندیخانەکان توند دەکرێن و، ڕۆژگارانی پیریشیان بە گریانی بەکوڵ و هەنسك و پەژارەی پڕ لە حەسرەت و خەم لێ دەگوزەرێت!

بەڵام ئەگەر لاو لە ڕێی پەروەردەی قورئان و بەهۆی ڕاستییەکانی پەیامەکانی نوورەوە خۆی پاراست، ئەوا دەبێ بە: لاوێکی ڕابەری ڕاستەقینە و، مرۆڤێکی کامڵ و، موسڵمانێکی بە ڕاستی بەختەوەر و، پادشای هەموو بوونەوەران.

بەڵێ، ئەگەر لاو تەنها یەك سەعاتی بیست و چوار سەعاتەکەی ڕۆژگارانی بەندیخانەی لە بەجێهێنانی فەرزەکاندا بەسەر ببات و لەو تاوان و گوناهانەی گەیاندوویانەتە بەندیخانە پەشیمان ببێتەوە و، وەك بەندیخانە لەو خراپکارییانەی دوور خستووەتەوە، بۆ خۆیشی دوور بکەوێتەوە لێیان، ئەوا چەندین سوودی زۆری دەست دەکەوێت بۆ ژیان و دواڕۆژی خۆی و بۆ وڵات و نەتەوە و کەسوکار و خۆشەویستانیشی، سەرەڕای ئەوەش کە لاوییەکی هەمیشەیی لە بەهەشتدا دەست دەکەوێت لە بریی لاویی کاتیی ئەم دنیای کە پازدە ساڵ ناخایەنێت.

هەموو کتێبە ئاسمانییەکان، لە پێش هەموویانەوە قورئانی پیرۆز، بەوپەڕی دڵنیاییەوە، مژدە و هەواڵی ئەم ڕاستییەمان دەدەنێ.

بەڵێ، ئەگەر لاو بە گرتنەبەری ڕێی ڕاست و ئەنجامدانی پەرستنەکان، شوکرانەبژێریی نیعمەتی "لاوی" بکات کە سەردەمێکی خۆش و جوانە، ئەوا ئەو نیعمەتی لاوییەی کە پێی بەخشراوە لە زیادبووندا دەبێت و کەم ناکات و دەمێنێت و تام و جوانییەکەشی پتر زیاد دەکات. دەنا لاوییەکەی لێ دەبێت بە بەڵا و گیروگرفتێکی بەسوێ و ئازار و، لەناو خەم و پەژارە و تەنگانەی ژیاندا ون دەبێت تا بە تەواوی دەڕوات و نامێنێت و، بەم پێیە

سـەردەمی لاوی‌یەکـەی دەبێـت بـە ئـەرکێکی قـورس بەسـەر شـانی خۆی و کەسـوکار و وڵات و نەتەوەکەیەوە بە گشتی.

ئنجا هەموو سەعاتێکی بـەندیی ئەو بـەندکراوەی بە نـاڕەوا و ستەم بڕیـاری بـەند کردنـی لەسەر دەرچووە، وەك پەرستنی ماوەی ڕۆژێکی تەواو وایە، بـە مـەرجێ فـەرزەکانی ئەستۆی بەجێ‌بهێنێت و، بەندیخانە - بۆ ئـەو - وەك ماڵـبەندێکی گۆشەگیریی لـێ دێـت، بـە چەشـنی زاهیـد و خواپەرسـتەکانی پێشـین کـە دەڕۆشـتنە نـاو ئەشـکەوتەکانەوە و بـۆ خواپەرسـتی لـێ‌دەبڕان. واتە دەکرێ ئەو بەندکراوە وەکو ئەو زاهیدانە وابێت.

هەروەها ئەگەر ئەو بەندکراوە کەسێکی هەژار و نەخۆش و پیر بێت و، دڵیشـی پەیوەستی ڕاستی‌یەکانی ئیمـان بێـت و، بۆ لای خـوای گـەورەی گەڕابێتـەوە و، فـەرزەکانی جێ‌بـەجێ بکات، ئەوا هەموو سەعاتێکی بەندیخانەی لە حوکمی بیسـت سـەعات پەرستشـدا دەبێـت و، بەندیخانە بۆ ئەو دەبێت بە قوتابخانەیەکی ئامۆژگاری و پەروەردەیی و ماڵـبەندی خۆشویسـتنی یەکتری. چونکە ڕۆژگارانی ژیانی لەوێ لەگەڵ هاوەڵانی‌دا بـە حەوانـەوە دەباتـە سـەر. ئەمـە سەرەڕای حەوانەوەی خۆی و سەرباری ئـەوەش کـە بـە چـاوی میهرەبانی‌یـەوە خـەڵکی بـۆی دەڕوانن. تەنانەت لەوانەیـە مانـەوەی بەندیخانـەی گەلـێ پـێ باشـتر بێـت لـەو سەربەستی‌یەی دەرەوە کـە لـە هـەموو لایەکەوە تـاوان و گونـاهی بەسـەردا دەبـارێت و، دڵـی بـەو وانـەی ئامۆژگـاری و پەروەردەکاری‌یانـەی نـاو بەندیخانـە دەکرێتـەوە، خـۆ کـاتێك کـە بەندیخانــەش بەجێ‌دەهێڵـێت وەکـو پیـاوکوژ و تۆڵەسـێنەر ناڕواتـە دەرەوە، بـەڵکو ئـەو کاتـە پیـاوێکی خواناسی باشـی تۆبـەکاری لـێ دەردەچێـت و، دەبێـت بـە ئەنـدامێکی سـوودبەخشـی نـاو وڵات و هاووڵاتی‌یان، بە ڕادەیەك کە هەندێك لەو کەسانەی لە بەندیخانەکەی دەنیزلی لەگەڵ ئێمـەدا بـەند کرابـوون، دوای ئـەوەی لـە ماوەیـەکی گەلـێ کـورت و کـەم خایـەندا چـەندین دەرس و ئامۆژگاری‌یـان لـە بـارەی ئیمـان و ڕەوشـت بەرزی‌یـەوە لـە "پەیامـەکانی نـوور" وەرگرت، وتیان:

(ئەگـەر بـەندکراوان لـە مـاوەی پێـنج حەفتـەدا دەرس و ئامۆژگـاری لـە پەیامـەکانی نـوور وەربگرن، گەلـێ باشترە بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵسوکەوتیان، تـاکو ئـەوەی پـازدە سـاڵ بخرێنـە بەندیخانەوە)!

جا مادەم مردن لـەناوناچێت و کاتەکەشی پـەردەی غـەیبی بەسـەردا دراوەتـەوە و هـەموو دەمێـك دەگونجـێ ڕووبـەڕووی ببینـەوە و.. دەرگـای گـۆڕیـش دانـاخرێت و، کاروانـەکانی مرۆڤایەتی یەك لە دوای یەك لە پشـت ئاسـۆی گـۆڕستانەوە ئـاوا دەبـن و.. مـردن خۆیشـی بـۆ ئیمانداران وەك نامەی تەسریح و ڕزگار کردن وایە لە ئیعدامی هەمیشەیی - وەك بـە ڕاسـتیی قورئان ئەمە ڕوون کراوەتەوە - هەروەها بـۆ گومڕا نەفامـەکانیش ئیعدامێکـی هەتاهەتایی‌یـە،

وەك خۆیـان وای دەبینـن، چونكـە مـردن جودایی‌یـەكی هەمیشـەیی‌یە لـە هـەموو كەسـوكار و خۆشەویستانیان تەنانەت لە هەموو بوونەوەرانیش بە گشتی..

مـادەم ئەمـە وایـە.. ئـەوا بـێ هیـچ گومـانێك بەختـەوەرترین مـرۆڤ ئـەو كەسـەیە كـە: شوكرانەی پەروەردگاری بكات و لە بەندیخانەكەیدا ئارامگر و چاوەڕوانی پاداشتی خـوای گەورە بێت و، دەرفەت لە كاتەكانی ئەوێی ببینێت و بە جوانـترین و باشـترین شـێوە بـەكاریان بهێنێت و، بەپێی ڕێنمایی پەیامەكانی نوور بۆ خزمەتی ئیمان و قورئان تێبكۆشێت.

ئەی مرۆڤی تووشبووی لەزەت و چێژی دنیا!

لـە مـاوەی حـەفتا و پێنـج سـاڵی تەمـەنمدا و، بـە هـەزاران تاقیكردنـەوەی ژیـانم و ئـەو ڕووداوانەی بەسەرم هاتوون، دڵنیا بووم لەوەی كە:

تـام و چێـژی ڕاسـتەقینە، كـە ئـازاری ئاوێتـە نـەبێت و، خۆشـی‌یەك خـەم و پـەژارە لێڵـی نەكات و بەختەوەریی ڕاستەقینە و بێ گەرد و تەواو تەنها بە "ئیمان" دەست دەكەوێت و لەناو بازنەی "ڕاستی‌یەكانی ئیمان"دایە. دەنا بێ ئەم ئیمانـە، تەنـها یـەك دانـە لـەزەتی دنیـا چـەندەها ئازاری زۆر و زەبەندی تێدایە، چونكە كاتێ كە دنیا لەزەتێكی بە ئەندازەی دەنكە ترێ‌یەكت پێشكەش دەكـات، دە دانـە زلـلـەی تونـدی بەسۆیشـت لـێ دەدات و، بەمـەش تـام و لـەزەتی ژیانت لـێ دەسێنێتەوە.

ئەی ئەو بێچارانەی كە دووچاری بەڵا و گرفتاری موسیبەتی بەندیخانە بوون!

مادەم دنیاكەتان لە گریـان و خەمباریدایـە و، ژیانیشـتان بـە ئـازار و بـەڵا و موسیبەت لێـڵ بووە، ئەوا تا دەتوانن تێبكۆشن دواڕۆژیشتان بە گریان و پەژارەوە لـێ نـەگوزەرێت و ژیـانی هەمیشەییتان بەختەوەر و شیرین بێت.

كەواتە برایانم! ئەم هەلە لەدەست مەدەن، چونكە هـەروەك دەكرێـت ئێشـكگرتنی مـاوەی یەك سەعات بەرامبەر سوپای دوژمن لە بارودۆخێكی دژواردا، بـە خـواپەرستیی مـاوەی یـەك ساڵ بژمێررێت، ئەوا هەموو سەعاتە سـەختەكانی ژیـانی بەندیخانـەتان، لـەودنیادا بـە چـەندەها سەعاتی خواپەرستی بـۆ دادەنرێـت، گـەر فـەرزەكانتان بەجێبـهێنن. دیـارە ئـەو كاتـەش دەردیسەری و بارە ناخۆشەكانتان بۆ دەبێت بە میهرەبانی و لێبوردن.

* * *

باسمه سبحانه

السلام علیكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیز و بەوەفاكانم!

سـێ ڕوونـاكیی دڵـدەرەوەم دی، وا لـە سـێ خـاڵدا ڕوونیـان دەكەمـەوە بۆ ئەوانـەی كـە دووچاری بەندیخانە بوون و ئەوانـەی چاودێری‌یـان دەكـەن و ئەوانـەش كـە لـە ئیش و كـار و

گوزه‌رانیاندا یارمه‌تی‌یان ده‌ده‌ن:

**خاڵی یه‌كه‌م:**

ده‌كرێ و ده‌گونجێ هه‌موو ڕۆژێكی ئه‌و ته‌مه‌نه‌ی له‌ به‌ندیخانه‌دا به‌سه‌ر ده‌برێت، پاداشتی په‌رستنی ده‌ دانه‌ ڕۆژ ده‌ستی مرۆڤ بخات و، ئه‌و سه‌عاتانه‌ش كه‌ له‌ ئه‌نجامدا له‌ناو ده‌چن، ده‌گونجێ بكرێن به‌ چه‌ندین سه‌عاتی نه‌مر و هه‌تاهه‌تایی. بگره‌ ده‌گونجێ بردنه‌سه‌ری چه‌ند ساڵێك له‌ به‌ندیخانه‌دا، بكرێت به‌هۆی ڕزگاربوون له‌ ملیۆنه‌ها ساڵی به‌ندیخانه‌ی هه‌میشه‌یی.

مه‌رجی ئه‌م قازانجه‌ مه‌زنه‌ی ئیمانداران، به‌جێهێنانی فه‌رزه‌كان و په‌شیمان بوونه‌وه‌یه‌ له‌ به‌رده‌م خوای گه‌وره‌دا له‌و تاوان و گوناهانه‌ی گه‌یاندوویانه‌ته‌ به‌ندیخانه‌ و، شوكرانه‌ بژێری و ئارامگرتنه‌ ته‌نها له‌به‌ر خوای گه‌وره‌. سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه‌ به‌ندیخانه‌ خۆیشی ده‌ستی مرۆڤ له‌ گه‌لێ گوناهـ ده‌گێڕێته‌وه‌.

**خاڵی دووهه‌م:**

نه‌مانی ئازار له‌زه‌ته‌ و، نه‌مانی له‌زه‌تیش ئازاره‌.

به‌ڵێ، هه‌ر كه‌سێك بیر له‌ ڕۆژانی خۆش گوزه‌رانیی ژیانی بكاته‌وه‌، ئه‌وا له‌ گیانی خۆی‌دا هه‌ست به‌ خه‌م و خه‌فه‌ت ده‌كات بۆ نه‌مانیان، به‌ چه‌شنێ كه‌ وشه‌ی ئاخ و داخی حه‌سره‌ت و په‌ژاره‌ له‌ زمانی ده‌رده‌چێت. به‌ڵام ئه‌گه‌ر بیر له‌ ڕۆژگارانی به‌ڵا و موسیبه‌تی بكاته‌وه‌، ئه‌وا له‌ دڵ و گیانی خۆی‌دا هه‌ست به‌ خۆشی و شادیی نه‌مانیان ده‌كات و، زمانیشی به‌ وتنی: "الحمد لله" و ده‌ربڕینی شوكرانه‌بژێریی خواوه‌ند، ئه‌و خۆشی‌یه‌ ده‌رده‌بڕێت، چونكه‌ به‌ڵا و گیروگرفته‌كانی ئه‌و ڕۆژانه‌ ڕۆشتن و پاداشتیان پاشه‌كه‌وت كرد. ئیتر ئه‌و مرۆڤه‌ دڵی به‌مه‌ ده‌كرێته‌وه‌ و بۆ خۆی ده‌حه‌وێته‌وه‌.

واته‌: ئازارێكی كاتیی یه‌ك سه‌عات، تام و له‌زه‌تێكی مه‌عنه‌وی له‌ گیاندا به‌جێ ده‌هێڵێت.. به‌ پێچه‌وانه‌شه‌وه‌ له‌زه‌تێكی كاتیی ته‌نها یه‌ك سه‌عات ئازارێكی مه‌عنه‌وی له‌ گیاندا به‌جێ‌ده‌هێڵێت!

جا مادەم "ڕاستی" به‌م جۆره‌یه‌ و، مادەم سه‌عاته‌كانی به‌ڵا و موسیبه‌تیش، كه‌ له‌گه‌ڵ ئازاره‌كانیاندا ڕۆشتن و به‌سه‌رچوون، وه‌كو ئه‌وه‌ وان كه‌ هه‌ر نه‌بووبێتن.. مادەم ڕۆژگارانی به‌ڵا و موسیبه‌تی ئاینده‌ش هێشتا نه‌هاتوون، كه‌واته‌ ئه‌وانیش وه‌ك "نه‌بوو" وان. خۆ دیاره‌ شتی "نه‌بوو"یش ئازاری نی‌یه‌..

مادەم وایه‌.. ئه‌وا ده‌ربڕینی بێ‌ئارامی و ترس و بیم له‌ ئازاره‌كانی ڕابوردوو و ئه‌وانه‌ی ئاینده‌ش كه‌ هێشتا نه‌هاتوون و هه‌موویان له‌ حوكمی "نه‌بوو"دان، به‌ گێلی و نه‌فامی داده‌نرێت.

هەروەها سکاڵا کردن لە دەست خوای گەورە و، موحاسەبە نەکردنی دەروونی بەدخوازی پڕقسوور و، کات بەسەربردن بە حەسرەت و هەنسکدان و خەم هەڵڕشتن، هەموو ئەمانە، ئەوپەڕی نەفامین. ئایا ئەو کەسەی کە ئەمە حاڵیەتی لەوە نەفامتر نی‌یە کە لە ترسی برسێتی و تینوێتیی ڕۆژانی ئایندەی، هەر لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارە، خەریکی خواردن و خواردنەوە بێت؟

بەڵێ، ئەگەر مرۆڤ هێزی ئارامگرتنی خۆی بە ڕاست و چەپدا - واتە بە ڕابوردوو و ئایندەدا - بڵاو نەکاتەوە و، ئاراستەی تەنها ئەو ڕۆژەی بکات کە تیایدایە، ئەوا تەنها ئەو هێزەی سەروزیادە بۆ کردنەوەی گرێ کوێرەی هەموو تەنگ و چەڵەمەکانی ژیانی.

تەنانەت من دەڵێم و - سکاڵاش ناکەم - ئەو سەخڵەت کردنە ماددی و مەعنەوی‌یانەی کە لەم قوتابخانە یووسفی‌یە سێ‌هەمەدا[1] و لەماوەی چەند ڕۆژێکدا هاتنە ڕێم، بە درێژایی ژیانم شتی وام نەدیوە، بە تایبەت مەحرووم کردنم لە خزمەتگوزاریی نوور، لەکاتێکدا کە چەندین نەخۆشی سەری تێ کردووم..

جا لەو کاتەدا کە دڵ و گیانم بەدەست ئەم هەموو تەنگی و نائومێدی‌یەوە پێکەوە دەگوشران، چاودێریی خوای گەورە ئەو ڕاستی‌یەی پێشووی بە هاناوە ناردم. ئیتر دڵم بە تەواوی کرایەوە و ئەو دڵتەنگی و سەخڵەتی‌یانەم نەمان و بە ئازاری بەندیخانە و نەخۆشی ڕازی بووم. چونکە هەر کەسێك وەك من لە لێواری گۆڕەکەی‌دا بێت، گەلێ قازانجیەتی یەك سەعاتی تەمەنی - کە دەگونجێ بە بێ ئاگایی لێی بڕوات - بە دە سەعات پەرستن بۆ بژمێررێت.

ئیتر شوکرانەیەکی زۆرم لەسەر ئەمە پێشکەشی خوای گەورە کرد.

**خاڵی سێ‌هەم:**

یارمەتیدانی پڕ سۆز و بەشەفەقەتی بەندکراوان و بەدەست‌گەیاندنی ڕزق و ڕۆزی‌یان کە پێویستیان پێ‌یەتی و، چارەسەر کردنی زامە مەعنەوی‌یەکانیان بە مەڵهەمی دڵنەوایی و دڵدانەوە. هەر یەك لەمانە هەرچەندە کارێکی ئاسانە، بەڵام پاداشتی گەلێ مەزن و زۆری تێدایە، چونکە بەدەست‌گەیاندنی ئەو ڕزق و ڕۆزی‌یەی کە لە دەرەوە بۆیان دێت لە حوکمی "سەدەقە"دایە و لە تۆماری کردەوە چاکەکانی ئەو کەسەدا دەنووسرێت کە ئەو ڕۆزی‌یەی بە دەستی ئەو بەندکراوە گەیاندووە، چ ئەوانەی لە دەرەوە بۆیان هێناوە، چ پاسەوانەکان و چ ئەو چاودێرانەش کە لەم کارەدا یارمەتی‌یان دەدەن. بە تایبەت ئەگەر بەندکراوەکە پیر و

(١) مەبەست بەندیخانەی شاری (ئافیوون)ە کە ساڵی ١٩٤٨ز ماملۆستا نوورسی و قوتابییانی نووری تێدا بەند کران. (وەرگێڕ)

بەتەمەن یان نەخۆش یان ئاوارە و دوور لە شاری خۆی یان هەژار و نەدارا بێت، ئەوا پاداشتی ئەو "سەدەقە مەعنەوی‌یە" گەلێ زیاتر دەبێت.

مەرجی ئەم قازانجە: ئەنجامدانی فەرزەکانە، بۆ ئەوەی ئەم خزمەتگوزاری‌یە تەنها لەبەر خوای گەورە بێت، لەگەڵ مەرجێکی تردا کە بریتی‌یە لەوەی ئەو خزمەتگوزاری‌یە هاوڕێی شەفەقەت و بەزەیی و سۆز و میهرەبانی و خۆشەویستی بێت و هیچ منەتێکی ئاوێتە نەبێت.

* * *

باسمه سبحانه

﴿وان من شيء إلاّ يسبح بحمده﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

ئەی برایانی ئایینی و هاوەڵانی بەندیخانەم!

وام بە دڵدا هات کە ڕاستی‌یەکی گرنگی واتان بۆ ڕوون بکەمەوە - پشت بە خوای گەورە - لە ئازاری دنیا و قیامەت ڕزگارتان بکات. ئەو ڕاستی‌یەش ئەمەی خوارەوەیە کە بە نموونەیەك ڕوونی دەکەمەوە:

گریمان یەکێك برای یان خزمی یەکێکی تری کوشت.. دیارە ئەم کوشتنەی کە لەبەر لەزەتی لەخۆبایی‌بوونی تۆڵەسەندنەوەیە و تەنها یەك دەقیقە دەخایەنێت، ئەشکەنجەی ملیۆنەها دەقیقەی دڵتەنگی و ئازاری بەندیخانەی لێ پەیدا دەبێت و، لە هەمان کاتدا کەسوکاری کوژراوەکەیش هەمیشە لە نیگەرانی و دڵەتەپێ‌دان و هەر کاتێك بکوژەکەیان بیر دەکەوێتەوە و کەسوکاری دەبینن، بۆ دەرفەت دەگەڕێن تاکو تۆڵەی خۆیان بسێننەوە.. بەم جۆرە لەزەتی تەمەن و خۆشگوزەرانیی ژیانیان بەدەم ئازاری بەسۆی ترس و بیم و دڵە تەپێ و ڕق و قینەوە لەدەست دەردەچێت و، هەردوو لایان لە ئازارێکی سەختدا دەتلێنەوە.

ئەم دەردە هیچ چارەسەری و دەرمانێکیشی نی‌یە جگە لە سوڵح و ڕێککەوتن کە قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ دەدات و حەق و ڕاستی داواکاری دەبن و، بەرژەوەندیی هەردوو لایشی تێدایە و، مرۆڤایەتی داخوازیەتی و، ئایینی ئیسلامیش هەردوو لای بۆ هان دەدات.

بەڵێ، بەرژەوەندی و ڕاستی لە ڕێککەوتندایە و کارێکی گەلێ باشە، چونکە "ئەجەل" هەر یەکێکە و گۆڕانی بۆ نی‌یە. هەرچۆن بێت دەبوو ئەو کوژراوە هەر ژیانی بەجێ بهێشتایە و نەمایە، مادەم ئەجەلی هاتبوو و، بکوژەکەیش بوو بە هۆکاری ئەنجامدانی ئەو قەزایەی خوای گەورە. جا ئەگەر هەردوو لا ڕێك نەکەون، ئەوا ماوەیەکی گەلێ زۆر و درێژخایەن لە ترس و بیم و ئازاری تۆڵەسەندنەوەدا دەتلێنەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئایینی ئیسلام فەرمانی داوە لە سێ ڕۆژ زیاتر موسڵمان لە برای موسڵمانی دەنگ دانەبڕێت.

جا ئەگەر ڕووداوی ئەو کوشتنە ئەنجامی دوژمنایەتی‌یەکی کۆن و ڕقەبەرایەتی‌یەکی ڕەگداکوتاو نەبێت و مونافقێك هۆکاری هەڵگرساندنی ئاگری ئەو فیتنە و ئاژاوەیە بوو بێت، ئەوا دەبێ یەکسەر ڕێك بکەون، دەنا ئەو موسیبەتە بچووکە گەورە دەبێت و درێژە دەکێشێت، گەر هەردوو لایش ڕێك بکەون و بکوژەکەیش لە تاوانەکەی خۆی پەشیمان بێتەوە و تۆبە بکات و بە بەردەوامی دوعای خێر بۆ کوژراوەکە بکات، ئەوا هەردوو لا دەستکەوتی زۆریان دەستگیر دەبێت، چونکە خۆشەویستی و ئولفەت دەکەوێتە نێوانیانەوە و ئەم لە دوژمنەکەی خۆش دەبێت و لە بریی یەك برا کە کۆچی کرد چەندین برای باش و خواناسی دەست دەکەوێت و هەردوو لا پێکەوە مل بۆ قەزا و قەدەری خوای گەورە کەچ دەکەن، بە تایبەت ئەگەر لەوانە بن کە گوێ بۆ دەرس و ڕێنماییەکانی "نوور" ڕادەگرن، ئەوانە لە هەموو کەس زیاتر داوایان لێ دەکرێت دوورەپەرێزی لە هەر شتێك بکەن کە نێوانی دوو کەس تێك بدات، چونکە ئەو برایەتی‌یەی کە لە چوارچێوەی نووردایە و دەیانبەستێت بە یەکەوە و، پاشان بەرژەوەندیی گشتی و، ئنجا ئەو دڵسافی و دەروونساغی‌یەش کە ئیمان داوای دەکات لێیان..

هەموو ئەمانە، داخوازی پشت‌گوێ‌خستنی ناکۆکی و دامەزراندنی ئاشتی و ئاسایش دەبن.

ئەمەی باسمان کرد، لە ڕاستی‌دا، لە بەندیخانەی دەنیزلی لە نێوان دوو بەندکراودا – کە دوژمنایەتیی یەکتریان دەکرد – ڕووی دا، دوای ئەوە، بە فەزڵی خوای گەورە و پاش وەرگرتنی چەند دەرسێك لە پەیامەکانی نوور، بوون بە برای خۆشەویستی یەکتر، تەنانەت بوون بە یەکێ لە هۆکارەکانی تەبرییەبوونمان، بە ڕادەیەك کە مولحید و نەفامەکانیش لە بەردەم ئەم خۆشەویستی‌یە برایانەی ئەو دوانەدا هیچیان بۆ نەمایەوە و ناچار بوون بڵێن: "ما شاء الله.. بارك الله.."! بەم جۆرە دڵی هەموو بەندکراوان گەشایەوە. چونکە لێرەدا بە چاو دەبینین کە چۆن ستەم لە بەندکراوان دەکرێت و بە تاوانی یەك کەس توندوتیژی لەگەڵ سەد کەسیاندا دەنوێنرێت، بە ڕادەیەك کە لە کاتی حەوانەوەشدا نایەڵن ئەو سەد کەسە لەبەر تەنها ئەو تاوانبارە بڕۆنە ناو حەوشەی بەندیخانەکەشەوە. بەڵام مرۆڤی ئیمانداری بەغیرەت جوامێری‌یەکەی هەرگیز ڕێی ئەوەی پێ نادات کە ئازاری هیچ ئیماندارێك بدات، چ جای ئەوەی لە پێناوی سوودی هەندەکی و کەمی خۆی‌دا ببێت بەهۆی ئازاردانی، کەواتە دەبێ هەر کە بە هەڵەی خۆی زانی و هەستی بەوە کرد کە بووە بەهۆی ئازاری ئیماندارێك، یەکسەر بە پەلە تۆبە بکات و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە.

باسمه سبحانه

﴿وإن من شيء إلاّ يسبّح بحمده﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

ئەی برا ئازیزە نوێیەکانم و ئەی بەندکراوانی پێشوو!

ئێستا گەیشتوومەتە قەناعەتێکی یەکجار تەواو بەوەی کە عینایەتی خوای گەورە ئێمەی لەبەر ئێوە گەیاندووەتە ئێرە. واتە هاتنمان بۆ ئێرە لەبەر بڵاوکردنەوەی ئەو دڵدانەوە و دڵنەواییەیە کە "پەیامەکانی نوور" بۆ ئێوەیان هێناوە و، بۆ کەمکردنەوەی تەنگ پێهەڵچنینەکانی بەندیخانەیە لەسەرتان بەهۆی "ڕاستییەکانی ئیمان" و، لەبەر پاراستنتانە لە گەلێ بەڵا و موسیبەت و تەنگانەی ژیان و.. بۆ دەربازکردنی ژیانی پڕ خەم و پەژارەتانە لە بێمەبەستی و بێسوودی و، بۆ ڕزگارکردنی ئەودنیاشتانە تاکو وەك ئەم دنیاتان لە گریان و خەم و پەژارەدا نەبێت.

جا مادەم ڕاستی ئەمەیە کە باسمان کرد، ئەوا دەبێ ئێوەش وەك قوتابییانی نوور و وەك ئەوانەی کە لە بەندیخانەی دەنیزلی لەگەڵماندا بوون، ببن بە برای خۆشەویستی یەکتری..

ئەوەتا بە چاوی خۆتان دەبینن ئەو پاسەوانانەی کە سوورن لەسەر خزمەتکردنتان، بە دەست پشکنینەوە گەلێ ماندوو دەبن، تەنانەت خواردنەکانیشتان دەپشکنن نەوەك ئامێرێکی تیژی تێدا بێت! ئەمەش لەبەر ئەوەی کارێك ڕوونەدات کە دەستدرێژی بکەنە سەر یەکتری، وەك بڵێی ئێوە دڕندە و خوێنمژ بن و، هەرکەسە بە ئارەزووی خۆی پەلاماری ئەوی تر بدات تاکو بیکوژێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دەرفەتی پشوودان و حەوانەوەشتان نادرێتێ، نەوەك شەڕ و ئاژاوەتان لە نێواندا دروست ببێت!

دەسا ئێوە و ئەو برایانەش کە تازەکی هاتوونەتە بەندیخانەوە و وەك ئێوە دارای ئازایەتی و جوامێرییەکی سروشتین، هەمووتان بەوپەڕی ئازایەتیی مەعنەوییەوە لە بەردەم دەستەی سەرپەرشتیارانی بەندیخانەدا بڵێن:

(نەك تەنها شتی تیژ، بەڵکو ئەگەر چەکە تازەکانیشمان بدەنێ، ئێمە هەر دەستدرێژی ناکەینە سەر ئەو برا و هاوەڵانەمان کە لەگەڵماندا دووچاری بەندی بوون، تەنانەت گەر دوژمنایەتیی کۆن و دێرینیشمان لە نێواندا ببێت ئێمە هیچ جۆرە کارێکی وا ناکەین، چونکە لە هەموویان خۆش بووین و تا دەتوانین هەوڵ دەدەین هەست و نەستی یەکتر زامدار نەکەین و دڵیان نەشکێنین. ئەمە بڕیارێکە بە ڕێنمایی قورئانی پیرۆز و فەرمانی برایەتیی ئیسلام و داخوازیی بەرژەوەندیی هەمووماندەرمان کردووە).

بەم جۆرە، "بەندیخانە" دەکەن بە "قوتابخانە"یەکی بەپیت و بەرەکەت.

## پاشکۆی مەقامی دووهەمی وتەی سیازدەهەم

مەسەلەیەکی گرنگە و شەوی "قەدر" بە دڵدا هات

**ئەمەی خوارەوە ڕاستییەکی فراوان و درێژە "شەوی قەدر" بە دڵمدا هات، وا هەوڵ دەدەم زۆر بە پوختی بەم جۆرەی خوارەوە ئاماژەی بۆ بکەم:**

**یەکەم:**

مرۆڤایەتی بە دەست ئەم جەنگە جیهانییەی دواییەوە گەلێ ئازاری چەشت، چونکە دژوارترین جۆرەکانی ستەم و دڕندەترین چەشنەکانی خۆسەپاندنی بە چاوی خۆی بینی، لەگەڵ ئەو کاولکارییە سامناکەی کە هەموو جێیەکی سەرزەویی گرتەوە، چونکە سەدان کەسی بێتاوان بە تاوانی یەك کەس دووچاری گیروگرفت و دەردیسەری بوون و، کەسانی بێدەستیش کەوتنە بەدبەختی و نەبوونییەکی تاباڵییی تاڵەوە و، سەرکەوتوانیش تووشی ئەشکەنجەیەکی ویژدانیی سەخت بوون، چونکە دەزانن توانای چاککردنەوەی ئەو کاولکارییەیان نییە کە کردوویانە و، لە مەترسیی ئەوەشدان کە نەتوانن پارێزگاریی دەستەڵاتەکەیان بکەن.

ئەو ڕاستییەش بە تەواوی بۆ خەڵکی دەرکەوت کە ژیانی دنیا - بێ هیچ گومانێك - ژیانێکی کاتی و لەناوچووە و زرق و برقەکانی شارستانێتیش بەنجکەر و لەخشتەبەرن و هیچ سوودێك بە مرۆڤ ناگەیەنن و، گرۆی مرۆڤایەتیش بە خوێنی ئەو دەست وەشاندنە بەهێزە سوور و خوێناوی بوو کە لە زاتی مرۆڤانە و ئامادەییە بەرزەکانی ناو سروشتی وەشێنران. هەروەها شکست و لەتوپەت بوونی "بێئاگایی" و "گومڕایی" و "سروشت"ی کەڕ و بێگیانیش بە شمشێری ئەڵماسیی قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا بۆ هەموو خەڵکی دەرکەوت و، ڕووە ڕاستەقینە چەپەڵ و ناشیرین و غەددارەکەی سیاسەتی نێودەوڵەتانیش ئاشکرا بوو کە چڕترین و ئەستوورترین و فراوانترین پەردەی لەخشتەبردن و گومڕایی کردنە و لە هەموویان زیاتر خەڵکی دەخنکێنێت و "گیان"یشیان فریو دەدات.

کەواتە پاش ڕوون بوونەوەی ئەمانە، بێ هیچ گومانێك، مرۆڤایەتی بە دوای "خۆشەویستی ڕاستەقینە"ی خۆیدا دەگەڕێت، کە ژیانی هەمیشەیی و نەمرییە و، بە هەموو توانایەوە بۆی تێدەکۆشێت. وا لە باکوور و ڕۆژئاوای جیهان و ئەمریکادا نیشانەکانی ئەمەی باسمان کرد دەرکەوتوون. هەروەها مرۆڤایەتی بە تەواوی تێدەگات ئەم ژیانەی دنیای کە بە چەشنێکی "مەجازی" خۆشی دەوێت و عاشقیەتی، ژیانێکی ناشیرین و لەناوچووە. ئەو کاتە - بێ هیچ گومانێك - بە دوای ئەو قورئانە پیرۆزەدا دەگەڕێت کە هەزار و سێ سەد و

شـــەست ساڵە لــە هــەموو چــەرخێکدا سێ سـەد ملیـۆن خزمــەتگوزار و قوتــابیی هەیــە و..
ملیۆنان کەســانی حەقڕەو تەسـدیقی هەموو یـەکێك لـە فەرمانـەکانی دەکـەن و.. لـە هـەموو
خولـەکێکدا ڕێـزی شایانی خـۆی لـە دڵـی هـەزاران لـەبەرکـەرانیدا دەگـیرێت و.. ڕێنمـایی
مرۆڤایەتی دەکـات بـە زمـانی خۆیـان و، بـە شـێوازە خـاوەن ئیعجـازەکەشـی مژدەی ژیـانی
نـەمری و بەختـەوەریی هەمیشـەییان دەداتێ و، بـەم کارەشـی زامـە بەسوێ و قووڵــەکانیان
سارێژ دەکات، بەڵکو ئـەم مژدەیـەی بـە هـەزاران ئایـەتی بـەهێزی خـۆی دووپـات دەکاتـەوە،
تەنانـەت دەیـان هــەزار جــاریش چ بــە ڕاشــکاوی و چ بــە ئامــاژە بــۆ کردن ئــەم هەواڵــە
ڕادەگەیەنێت و چەندەها بەڵگەی گومانبڕ و ڕوون و چەسپاویشی لەسەر دەهێنێتەوە.

جا ئەگەر مرۆڤایەتی بە تەواوی ژێریی لەدەست نەدات و، قیامەتێکی ماددی یان مەعنەوی نەیەتە ڕێی، ئـەوا بـە حـەتمی بـە دوای قورئـانی پیرۆزی خـاوەن ئیعجـازدا دەگـەڕێت، وەك لـە هەموو کیشوەرەکانی جیهان و دەوڵەتە مەزنەکان و سوید و نەرویج و فینلەندەدا ئەمـە ڕووی دا و، هــەروەها وەك ئــەوەی کــە چــەندین وتــاربێژ و قســەزانی بــەناوبانگی ئینگلتــەرا بــۆ قبووڵکردنی تێدەکۆشن و، کۆمەڵەیەکی گرنگی ئەمریکایش کە بە دوای ئـایینی ڕاستەقینەدا عەوداڵە، لێی دەکۆڵێتەوە.. جا ئەمانەی کە باس کران، دوای تێگەیشتن لە ڕاستییەکانی ئەو قورئانـە، بێ هیـچ گومـانێك دەستی پێـوە دەگـرن و، بـە گیـان و هـەناوی خۆیـان لــە دەوری کۆدەبنـەوە. چونکـە سـەبارەت بـە چارەسـەریی ئـەم ڕاستییە هیـچ شتێك نییـە هاوچەشـنی قورئانی پیرۆز بێت و لەمەولاش نابێت و، بە هیچ جۆرێك ناگونجێ شتێکی تر ببێت جێی ئەم موعجیزە مەزنە بگرێتەوە.

**دووهەم:**

"پەیامـەکانی نـوور" بـە وێنـەی شمشێرێکی ئـەڵماس بـە دەسـتی ئـەم موعجـیزە مەزنـەوە، خزمەتگوزاریەکانی خۆیان بە ڕادەیەك دەرخسـت کـە دوژمنـە سەرسەختەکانیشـی بـە بەڵگـە دەمکوت کرد و ناچاری تەسلیم بوونی کردن و، لەو ڕووەشەوە کە موعجیزەیەکی واتا پڕ لـە ئیعجازەکانی قورئانن، لە بەردەم ئەم گەنجینەیەی قورئـاندا ئـەرك و فرمـانی سەرشـانی خۆیـان بـەجێدەهێنن، بـە ڕادەیـەك کـە دەتوانـن دڵ و گیـان و گشـت هەسـتەکانی مـرۆڤ ڕوونـاك بکەنەوە و چارەسەریی شیفابەخش بە هەریەکەیان ببەخشـن. ئەمەیشـت بـەلاوە سـەیر نـەبێت، چونکە ئەم پەیامانە کاری بانگەواز کردنیان بۆ قورئانی پیرۆز گرتووەتە ئەستۆ و هەر تەنها لــە قورئان لێشاوی فەڕ و بەرەکەت وەردەگرن و قورئان تاکە سەرچاوەیانە.

ئەم پەیامانە هەروەك بە تەواوی ئەرکی سەرشانیان جێبـەجێ دەکـەن، لـە هەمان کاتیشدا بەسەر ئـەو پڕوپاگـەندە چەپـەڵ و ناڕەوایەشـدا سـەرکەوتن کـە دوژمنـانی پەیامـەکان بڵاویـان دەکـردەوە و کەللـەڕەقترین زەندیقیـان لـەناوبرد و، سـەختترین قـەڵاکانی گومڕاییشـیان کـە

"سروشت"ە و پەنایان پێ دەبرد بە "پەیامی سروشت" لـە بناغـەدا هەڵتـەکاند و داریـان بەسـەر بەردیەوە نەهێشـت. هـەروەها بـە "مەسـەلەی شەشـەمی بـەری درەختـی ئیمـان" و بەڵگـەکانی یەکـەم و دووهـەم و سێهەم و هەشتەمی پـەیامی "عەسـای مووسـا"یش لـە مـەیدانی زانسـتە نوێکـان و چڕتریـن تاریکی‌یـە خنکێنـەرەکانی "بێئاگـایی"دا، بێئاگایی‌یـان لـەو گـۆڕەدا نەهێشت و نووری تەوحیدیان تێدا ئاشکرا کرد.

ئـا لـێرەوە دەردەکەوێت کە پێویستە بـۆ ئێمـە - بـۆ نەتـەوەش گەلـێ پێویسـتترە - لـە چوارچێوە و سنووری توانـا و لـە هـەموو جێیـەکدا قوتابییـانی نـوور چـەندین قوتابخانـەی نووریی بچووك بکەنەوە، دوای ئەوەی کە دەوڵەت لـەم کاتـەدا دەرفـەتی داوە بـە کردنـەوەی قوتابخانـەی تایبـەتی بـۆ وتنـەوەی ئایین[١]. ڕاسـتە هـەموو خوێنـەرێکی "پەیامـەکانی نـوور" دەتوانێت سوودێك بۆ خۆی وەربگرێت. بەڵام ناتوانێت لـە هـەموو مەسـەلەکانی بـە تـەواوی تێبـگات، چونـکە ئەو پەیامانـە ڕوونکـردنەوەی ڕاسـتی‌یەکانی ئیمـانن، کەواتـە وانـەی زانستی و، خواناسی و، سرەوتی دڵ و، خواپەرستین، لە یەك کاتدا[٢].

ئەو ئەنجام و بەرهەمانەی کە دەگونجا بۆ ماوەی پێنج یان دە ساڵ لە قوتابخانە ئایینی‌یـەکاندا دەست بکەوتنایە، دەتوانرێت لە قوتابخانەکانی نووردا بە ماوەی پێنج یان دە حەفتە - بە ئـیزنی خوا - دەست بکەون، بگرە - سوپاس بۆ خوای گەورە - لە ماوەی بیست ساڵی ڕابوردوودا ئەو ئەنجام و بەرهەمانەیان هێنایەدی.

ئنجـا سـوودی ئەم پەیامانـە، کـە بانگـەوازکار و چـەند بریسـکانەوەیەکی ڕووناکی‌یـە گەشەدارەکەی قورئانن، بۆ ژیانی نەتەوە و ئاسایشی نێو وڵات شتێکی سەلمێنراوە، تەنانەت بۆ ژیانی ڕامیاریش، چ جای ژیانی ئەودنیای. کەواتە گەلـێ پێویستە دەوڵـەت بـە نیـازی خـراپ دەستیان بۆ درێژ نەکات، بەڵکو بە لـێبرانەوە بۆ بـڵاو کردنـەوەیان تێبکۆشـێت و خـەڵکی بـۆ خوێندنەوەیان هان بدات، تاکو ئەم کارەی بکات بە کەفارەتی خراپکاری‌یە پێشـووەکانی و، ببێت بە بەربەستێکی مەحکـەم لـە ڕووی ئـەو بـەڵا و موسیبەت و ئاشـووب و تۆقاندنکـاری و مەترسی‌یانەی لە داهاتوودا دێنەپێش.

---

(١) چونکە قوتابخانە ئایینی‌یەکان لـە تورکیـادا هـەر لـە سەرەتای ساڵەکانی بیستەوە تـا ساڵـی ١٩٥٠ز قەدەغـە کرابوون. (وەرگێڕ)

(٢) تەنانەت گەر کەسێکیش هەبێت پێویستی بـە "فێربوون" نـەبێت، ئـەوا بێگومـان هـەر پێویستی بـە پەرستش و، ناسینی خوای گەورە و، سرەوت و ئاسوودەیی دڵی هەیە. لەبەر ئەوە، پەیامەکانی نوور وانەیەکی پێویستن بۆ هەموو کەسێك. (دانەر)

## مەسەلەی شەشەمی بەری درەختی ئیمان

**(ئەم مەسەلەیە ئاماژەیەکی کورتە بۆ تەنها یەك بەڵگــە لــە نێـوان هــەزاران بەڵگەی گشتیدا ســەبارەت بــە (ئیمـان بـە خـوا) کـە لـە زۆر شـوێنی تـری پەیامەکانی نووردا بە بەڵگەی چەسپێنەرەوە ڕوون کراونەتەوە).**

کـۆمەڵێك لە قـوتابییانی قۆناغی ئامادەیی لە شـاری "قەسـتەمۆنی"[1] هاتن بۆلام و پێیـان وتم:

- (خوای بەدیهێنەرمان پێ بناسێنە، چونکە مامۆستاکانمان باسی خوامان بۆ ناکەن)!

پێم وتن:

- هەریەك لەو زانستانەی دەیانخوێنن، هەمیشە باسی خـوا دەکـات و بـە زمـانی تایبـەتیی خۆی خواوەندی بەخشندەمان پێ دەناسێنێت. کەواتە ئێوەش لە بریی مامۆسـتاکان گـوێ بـۆ زانستەکان ڕابگرن!

❖ بۆ نموونە:

هەروەك هەر شووشە دەرمان و پێکهاتوویەکی کیمیایی ناو دەرمانخانەیەکی گـەورە، کە بە چەندین تەرازووی سەرنەکەر و ئەندازەی ورد ئاوێتەی یەکتر کرابێـتن، دەیچەسپێنێت کە دەرمانگـەرێکی دانـا و کیمیاگـەرێکی زانـا ئـەم کارانـەی ئـەنجام داوە.. دەرمانخانــەی گــۆی زەویش، کە چوار سەد هەزار جۆری ڕووەك و زینـدەوەری زیـاتر تێدایـە، بـە هـەمان جـۆرە.. چونکە لە ڕاستیدا هەریەکە لەو ڕووەك و زیندەوەرانە وەك شووشـەیەکی پڕ لـە پێکـهاتووی ورد و، ئاوێتەکراوێکی زیندەکاری سەرسووڕهێنەر وایە.

جا ئەم دەرمانخانە گەورەیە، خواوەندی دانا و شکۆمەند پیشانی هەموو کەسێك، تەنانەت کوێرەکـانیش، دەدات و، بـە ئـەندازەی پلــەی کـەماڵ و ڕێکوپێکـی و گەورەییەکــەی، بەدیهێنـەری بەخشـندە بـە غـەیری خـۆی دەناسـێنێت، بـە چەشـنی دەرمانخانەکەی بـازاڕ، کـە

(١) شارێکە دەکەوێتە باکووری تورکیا و لە سالی ١٩٣٧زدا مامۆستا نوورسی بۆ ئەوێ نەفی کراوە و تـا سـالی ١٩٤٣ز تیایدا دەست بەسەر بووە، ئنجا لەم بەروارەوە بە بەندکراوی براوە بۆ دادگـای گـەورەی جـەزا لـە شـاری دەنیزلی. (وەرگێڕ)

کیمیاگەر و دروستکەری خۆی ناساند. ئەمەش بەپێی زانستی "پزیشکی" کە خۆتان دەیخوێنن.

❖ نموونەیەکی تر:

هەروەك ئەگەر کارگەیەکی گەورە و نائاسایی لە تەنها ماددەیەکی زۆر ساکار چەندین جۆر کووتاڵی جۆراوجۆر بچنێت و بەرهەمیان بهێنێت، ئەوا بەم کارەی دەیچەسپێنێت کە بێ هیچ گومانێك ئەندازیارێکی میکانیکیی کارامە هەیە ئەم کارانە ڕادەپەڕێنێت. بەم جۆرە ئەو کارگەیە ئەندازیارەکەمان پێ دەناسێنێت.

ئەم مەکینە هاتوچۆکەر و کارگە خواییەش، کە ناوی گۆی زەوییە، بە هەمان چەشنە، کە سەدان هەزار کارگەی سەرەکیی تێدایە و هەریەك لەم کارگە سەرەکییانەش هەزار کارگەی وردەکاری تێدایە و، هەریەکەیان - بێ هیچ گومانێك - خاوەن و بەدیهێنەری خۆیمان، بە ئەندازەی گەورەیی و کەماڵی ئەم کارگە خواییە لەچاو کارگە ئادەمییەکەدا، پێ دەناسێنێت، هەروەك کارگە ئادەمییەکە ئەندازیاری خۆی پێ ناساندین. ئەمەش بەپێی دەستوورەکانی زانستی "میکانیك" کە دەیخوێنن.

❖ نموونەیەکی تر:

هەروەك کۆگا و گەنجینەیەکی گەورەی ئازووقە، کە لە هەموو لایەکەوە هەزار جۆر خواردەمەنیی تێدا ئامادە کرابێت و لەیەك جیا کرابنەوە و هەریەکەیان لە جێگایەکی تایبەتیدا ڕیز کرابن، تێمان دەگەیەنێت کە خاوەن و بەڕێوەبەرێکی هەیە سەرپەرشتیی دەکات..

ئەم گەنجینەی ڕۆزیدانە خواییەش بە هەمان جۆرە..

ئەم گەنجینەیەی کە لە گەشتی یەك "ساڵ"یدا ماوەی بیست و چوار هەزار ساڵ ڕێ بەوپەڕی ڕێکوپێکی دەبڕێت و، سەدان هەزار بەدیهێنراوی لەناودا هەن کە هەریەکەیان پێویستی بە جۆرێك خواردەمەنیی تایبەتی هەیە..

ئەم گەنجینەیەی کە بەسەر هەر چوار وەرزەکەدا تێپەڕ دەبێت و، وەرزی بەهار وەك کاروانێك کە هەزاران جۆر خواردەمەنیی پێ بێت، لەگەڵ خۆیدا بۆ هەموو ئەو هەژارانە دەهێنێت کە لە زستاندا خۆراك و ئازووقەیان لێ براوە..

ئەم گەنجینە خواییە (کە گۆی زەوییە) وەك کەشتییەکی خوایی وایە و هەزاران جۆری کەرەسە و کۆئەندام و قوتووی خواردەمەنیی تێدایە..

ئەم گەنجینە و کۆگا پەروەردگارییە، بەپێی دەستوورەکانی زانستی: (ژیانسازی و بازرگانی) کە ئێوە دەیخوێنن، وە بە ئەندازەی گەورەیی خودی گەنجینەکە، خاوەن و

كارسازی خۆیمان پیشان دەدات و پێمان دەناسێنێت و لە لامان خۆشەویستی دەکات. هەروەك ئەو گەنجینەیەی کە دەستکردی مرۆڤ بوو، خاوەن و بەڕێوەبەرەکەی خۆی پێ ناساندین.

❖ نموونەیەکی تر:

ئەگەر سوپایەکی گەورە چوارسەد هەزار گەل و نەتەوەی جیاجیای لە ژێر ئالآکەی خۆیدا کۆ کردبێتەوە و، هەریەك لەو ڕەگەز و نەتەوانەش خواردەمەنیی لەوانی تر جیاواز بێت و، چەکی هیچیان لە هی تریان نەچێت و، بەرگ و پۆشاك و شێوەی مەشق کردن و جۆری تەعلیمات و ماوەی پشوودانیان لە یەکتر جیا بێت و، پێشەوای ئەو سوپایە، بێ ئەوەی هیچیانی لەبیر بچێتەوە یان سەری لێ تێکبچێت، خۆراك و پۆشاکی جیاجیایان بداتێ..

ئەو سوپایەی بەم جۆرە بێت، دەریدەخات کە: پێشەواکەی کەسێکی بێ وێنە و ناوازەیە..

جا هەروەك ئەم سەربازگە سەرسووڕهێنەرە ئەو پێشەوا ناوازەیەمان بۆ دەردەخات و پێمان دەناسێنێت و، تەنانەت خۆشەویستیشی دەکات لە لامان، سەربازگەی "زەوی"یش بە هەمان جۆرە. چونکە سەربازگەی زەوی لە هەموو بەهارێکدا سەرلەنوێ سوپایەکی خوایی گەورە لە چوارسەد هەزار ڕەگەز و جۆری گەلانی ڕووەك و نەتەوە جیاجیاکانی زیندەوەران پێکدەهێنێت و، هەر جۆرەشیان پۆشاك و، خۆراك و، چەك و، مەشق و، پشووی تایبەتیی خۆی لە لایەن پێشەوایەکی گەورەی تاك و تەنیاوە، بە بێ لەبیرچوونی هیچ کامێکیان، یان لێ تێکچوون، یان سەرگەردان بوون و، بەوپەڕی تەواوی و ڕێکوپێکیشەوە، پێ دەبەخشرێت.

جا بەپێی "زانستە سەربازییەکان" ئەم سەربازگە بەرین و فراوانەی وەرزی بەهار کە بە پانایی گۆی زەوی بڵاو بووەتەوە، بەڕێوەبەر و پەروەردگار و پێشەوای هەرە مەزن و پیرۆزی خۆی پیشانی هەموو ئەوانە دەدات کە خاوەنی دڵ و دەروون و تێگەیشتن و ژیرین و، بە ئەندازەی پلەی کەماڵ و گەورەیی ئەم سەربازگەیە، ئەو پەروەردگارەیان پێ دەناسێنێت و، لە ڕێگای تەقدیس و تەسبیح و ڕێزلێنان و سوپاس کردنەوە، لە لایان خۆشەویستی دەکات. وەك سەربازگە ناوبراوەکە ئەمەی سەبارەت بە پێشەواکەی خۆی کرد.

❖ نموونەیەکی تر:

وا دابنێ کە ملیۆنان گڵۆپی کارەبا لەناو شارێکی سەرسووڕهێنەردا، بە بێ ئەوەی سووتەمەنییان لێ ببڕێت و بکوژێنەوە، هاتوچۆ بکەن.

ئایا ئەم کارە – لەگەڵ دەربڕینی ڕێز و سەرسووڕماندا – دەری ناخات کە: ئەندازیارێکی بێ هاوتا و کارەباچییەکی کارامە هەیە، کارگەی کارەباکە و ئەو گڵۆپانەی لەژێر دەستدایە؟

بە هەمان جۆر، گڵۆپی ئەو ئەستێرانەش کە بە بنمیچی خانەی زەوییەوە شۆڕ بوونەتەوە و، بەپێی زانیاریی فەلەك هەندێکیان بە هەزاران جار لە گۆی زەوی گەورەترن و، خێراییان لە هی تۆپی تۆپخانەکان زیاترە و، بێ ئەوەی ڕێسای نێوانیان تێكبچێت و لە یەکتر بدەن و بێ کوژانەوە و تەواوبوونی سووتەمەنی کاردەکەن، وەك لە زانیاریی فەلەکدا دەیخوێنن.. ئەم ئەستێرانە، بە چەشنێکی ڕووناك، ئاماژە بۆ بەدیهێنەری خۆیان دەکەن.

بۆ نموونە: "خۆر" کە یەك ملیۆن جار لە زەویی خۆمان گەورەترە و یەك ملیۆن ساڵیش لە زەوی کۆنترە، یەکێکە لەو گڵۆپ و ئاگردانە هەمیشەییانەی میوانخانەی خواوەندی میهرەبان. جا بۆ ئەوەی هەمیشە دابگرسێت و گڕ بگرێ و سووتەمەنیی لێ نەبڕێت، هەموو ڕۆژێك پێویستیی بە ئەندازەی دەریاکانی زەوی سووتەمەنی و، چیاکانی زەوی خەڵووز و، چەندین ئەوەندەی قەبارەی زەویش دار دەبێت، تاکو ئەو بەردەوامییەی بۆ بڕەخسێت..

کەچی ئەو توانستەی کە "خۆر" و هەموو ئەستێرەکانی تری هاوچەشنی خۆر دادەگرسێنێت، بە بێ هیچ سووتەمەنی و خەڵووز و ڕۆنێك ئەم کارە دەکات و نایەڵێت بکوژێتیشەوە و، بە خێراییەکی یەکجار گەورە و بێ لەیەکدان لە شوێنی خۆیاندا دەیانسووڕێنێت. بێ گومان ئەو توانستەی کە ئەم کارە ڕایی دەکات، توانستێکی بێ کۆتایی و دەسەڵاتێکی تابلێی گەورەی بێ سنوورە.

کەواتە ئەم بوونەوەرە مەزنە و هەرچی گڵۆپ و چرای ڕووناکی تێدایە و پیایدا شۆڕ کراونەتەوە، بە جوانی و بەپێی دەستوورەکانی زانستی "کارەبا" – کە خوێندووتانە یان لەمەولا دەیخوێنن – پادشا و دەسەڵاتداری ئەم پیشانگا و میهرەجانە گەورەیە دەردەخات و، ڕووناك کەرەوە و کارساز و بەدیهێنەری خاوەن شکۆی خۆی، بە شایەتیی هەموو ئەستێرە درەخشانەکان بە هەموان دەناسێنێت و، لە ڕێگای سوپاسگوزاری و تەقدیس کردنەوە لە لایان خۆشەویستی دەکات، تەنانەت بۆ پەرستنیشی هانیان دەدات.

❖ نموونەیەکی تر:

ئەگەر کتێبێك هەبێت لە هەموو دێڕێکیدا کتێبێك بە خەتێکی ورد و، لە هەموو وشەیەکیدا سوورەتێکی قورئانی تێدا نووسرابێت و، هەریەك لەو مەسەلە و بابەتانەش کە لێیان دەدوێت ورد و پڕواتا بن و پشتی یەکتری بگرن، گەر کتێبێکی وا بێت، ئەوا ئەو

کتێبە، بێ هیچ گومانێك، کارامەیی لەڕادەبەدەری نووسەرەکەی و توانستی تەواوی دانەرەکەی دەردەخات.. واتە ئەم جۆرە کتێبە وەك ڕووناکیی خۆر نووسەرەکەی بە خەڵکی دەناسێنێت و کەماڵی توانستی ئەو دەردەخات و، بە چەشنێکی وا ڕێز و تەقدیری سەیرکەرانی ڕادەکێشێت کە یەکسەر لەبەر خۆیانەوە بڵێن: "تبارك الله، سبحان الله، ما شاء الله".

کتێبی مەزن و گەورەی ئەم گەردوونەش وایە، کە تەنها لە یەك لاپەڕەیدا - کە گۆی زەوی‌یە - و لە یەك مەلزەمەیدا - کە وەرزی بەهارە - سێ‌سەد هەزار کتێبی جیاجیا، کە ڕووەك و زیندەوەرانن، دەنووسرێن و، هەریەکەیان وەك کتێبێك وان. هەموو ئەمانەش پێکەوە و بە بێ تێکەڵبوون و هەڵە و لەبیرچوونەوە و بەوپەڕی ڕێکوپێکی‌یەوە، دەنووسرێن. تەنانەت لە تەنها وشەیەکی‌دا (وەك درەخت) پارچە شیعرێکی تەواوەتی و، لە یەك دانە نوختەی‌دا (وەك تۆو) پێڕستی کتێبێکی سەربەخۆ دەنووسرێت.

جا هەروەك ئەمە شتێکە لەبەرچاوماندایە و بێ هیچ گومانێك پیشانمان دەدات کە لە پشتی ئەم نووسینانەوە قەڵەمێکی کارامە هەیە دەیاننووسێت.. ئەوا دەتوانن بۆ خۆتان ئەوە لێك بدەنەوە کە ئایا مەودای بەڵگەی کتێبی گەورە و مەزنی گەردوون، کە لە هەموو وشەیەکی‌دا چەندین واتا و دانایی تێدایە و.. مەودای بەڵگەی ئەم قورئانە گەورە بەرجەستەیە - کە جیهانە - بزانن چەندەیە و چۆن دەبێت بە بەڵگە لەسەر خواوەندی نووسەری خۆی، هەروەك ئەو کتێبەی لە نموونەکەدا باس کرا، بوو بە بەڵگە لەسەر نووسەرەکەی..

ئەمەش بەپێی داخوازیی (زانستی حیکمەتی شتان) و (هونەری خوێندنەوە و نووسین) کە دەیانخوێنن و، بە تەرازوویەکی گەورەتر و ڕوانینێکی فراوانتر بۆ ئەم کتێبە گەورەیەی گەردوون، دەردەکەوێت. تەنانەت ئەو کاتە تێ‌دەگەن کە چۆن ئەم کتێبە گەورەیەی گەردوون بە "الله أكبر"کردن خوای بەدیهێنەری خۆی دەناسێنێت و، بە "سبحان الله" تەقدیسی ئەو خوایەمان فێر دەکات و، بە سوپاسگوزاریی: "الحمد لله"ش ئەو خواوەندەمان لە لا خۆشەویست دەکات!

بەم جۆرە و بەپێی ئەوانەی باسمان کردن، هەریەکە لەو زانستە لەژمارەبەدەر و زۆرانە، بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەری شکۆمەندی بوونەوەر و، خوای گەورەمان بە ناوە جوانەکانی و کەمالات و سیفەتە بەرزەکانی پێ دەناسێنێت. ئەمەش بەهۆی ئەو تەرازووە فراوان و، ئاوێنە تایبەتی و، چاوە تیژ و بینەر و، ڕوانینە پڕ لە پەندانەی کە لەناو هەریەك لەو زانستانەدا هەن.

بەو قوتابی‌یە لاوانەم وت:

حیکمەتی دووپات بوونەوەکانی قورئانی پیرۆز، وەك: ﴿**خلقَ السموات والأرضَ**﴾ و ﴿**ربُّ السمواتِ والأرض**﴾ لە پێناوی ڕێنمایی کردنی خەڵکی‌دایە بۆ ئەو ڕاستی‌یەی کە باسمان کرد. هەروەها بۆ ئەوەیە کە ئەم بەڵگە بەهێز و ڕووناکەی "تەوحید"مان فێر بکات و بەدیهێنەری مەزنمان پێ بناسێنێت.

ئەوانیش وتیان:

(سوپاسی لەژمارەبەدەر پێشکەشی پەروەردگاری بەدیهێنەرمان بێت، لەسەر ئەم وانەیەی کە لە ڕاستی‌دا حەقیقەتێکی گەلێ بەرزە، خوات لێ ڕازی بێت و پاداشتی چاکەت بداتەوە).

ئنجا پێم وتن:

مرۆڤ مەکینەیەکی زیندەکارە، هەزاران جۆر ئازار و هەزاران جۆر تام و لەزەت لە ژیاندا دەچێژێت..

ئەم مرۆڤە هەروەك لەوپەڕی دەستەوسانی و کۆڵەواری‌دایە، لە هەمان کاتیشدا ئەوەندە دوژمنی ماددی و مەعنەویی هەیە کە لە ژمارە نایەن..

هەرچەند لەوپەڕی هەژاری‌دایە، ئەوەندە ئارەزووی دیار و نادیاریشی هەیە کە لە باس کردن نایەن..

کەواتە مرۆڤ بەدیهێنراوێکی ئەوەندە هەژارە کە هەمیشە زللەی نەمان و جودایی دەخوات. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە، هەرکات بەهۆی پەرستش و ئیمانەوە پشت بە خواوەند و پادشای شکۆمەندی خۆی ببەستێ، ئەوا پاڵپشتێکی گەورە و بەهێزی ئەوتۆی دەست دەکەوێت کە بتوانێت لە دەست هەموو دوژمنانی ڕزگاری بێت و، یارمەتی‌یەکی وای دەستگیر دەبێت کە بۆ بەدەستهێنانی ئاواتەکانی پشتی پێ ببەستێت.

چونکە هەروەك مرۆڤ نیسبەت و پەیوەندیی لەگەڵ کەسانی لە خۆی گەورەتردا هەیە و بەم پەیوەندی و نیسبەتبوونەش بۆ لای گەورەکەی و ڕێزی لای ئەو، شانازی دەکات..

هەر بەم جۆرەش نیسبەت پەیدا کردنی مرۆڤ بەهۆی ئیمانەوە لەگەڵ ئەو خواوەندە بەتوانایەدا کە خاوەنی توانستێکی بێ‌سنوورە و، ئەو پادشا بە بەزەیی‌یەی کە میهرەبانی‌یەکی فراوانی هەیە و، پەرستنی لە ڕێی گوێڕایەڵی و شوکرانەبژێری کردنیەوە.. ئەم کارە وا لە (مردن) دەکات، کە خۆی لە خۆی‌دا ئیعدامێکی هەمیشەیی‌یە، بۆ ئەو ئیماندارە ببێت بە بلیتی سەفەر و پشوو وەرگرتن بۆ ڕۆشتن بەرەو جیهانی هەمیشەیی!

خۆتان ده‌توانن ئه‌ندازه‌ی ئه‌وه لێك بده‌نه‌وه، كه ئه‌م مرۆڤه له به‌رده‌م گه‌وره‌كه‌ی خۆی‌دا ده‌بێ چه‌نده له‌زه‌تی شیرینی په‌رستن بچێژێت و، چه‌نده سوپاسگوزاری ئه‌و ئیمانه بێت كه له دڵدا هه‌ستی پێ ده‌كات و، چه‌نده به نووری ئیسلام به‌خته‌وه‌ر بێت و، شانازی به خوای گه‌وره و به‌توانا و میهره‌بانی خۆی بكات و هه‌رده‌م له شوكرانه‌بژێریی نیعمه‌تی ئیمان و ئیسلامدا بێت.

هه‌روه‌ك ئه‌مه‌م به برا قوتابی‌یه‌كانم وت، هه‌روه‌ها به به‌ندكراوانیشی ده‌ڵێم:

ئه‌وه‌ی خوا بناسێت و گوێڕایه‌ڵیی فه‌رمانه‌كانی بكات، با له به‌ندیخانه‌شدا بێت هه‌ر به‌خته‌وه‌ره. ئه‌و كه‌سه‌ش له خوا بێ‌ئاگا بێت و خوای له یاد چووبێت، با له كۆشك و ته‌لاریشدا بژی، هه‌ر به‌دبه‌خت و سه‌ر لێ شێواوه!

ڕۆژێكیان سته‌م لێكراوێك له‌و كاته‌دا كه به‌وپه‌ڕی شادمانی‌یه‌وه به داری سێداره‌كه‌ی‌دا سه‌رده‌كه‌وت، ڕووی كرده سته‌مكارانی و به ده‌نگی به‌رز و زوڵاڵ پێی وتن:

- (من له‌ناوناچم و به‌ره‌و نه‌مان ناڕۆم، به‌ڵكو له به‌ندیخانه‌ی دنیا ده‌رباز ده‌بم و به‌ره‌و به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشه‌یی ده‌ڕۆم.. به‌ڵام ده‌بینم ئێوه فه‌رمانی له‌ناوچوونی هه‌میشه‌ییتان بۆ ده‌رچووه، چونكه وا گومان ده‌به‌ن كه مردن نه‌مان و له‌ناوچوونه. كه‌واته من تۆڵه‌ی خۆمم لێ سه‌ندوونه‌ته‌وه). ئه‌مه‌ی وت و، له‌گه‌ڵ دووپات كردنه‌وه‌ی: "لا إلــه إلا الله"دا به چاوی ڕوون و ڕووی گه‌شه‌وه گیانی سپارد!

**﴿سبحانك لا علم لنا إلا ما علّمتنا إنك أنت العليم الحكيم﴾**.

* * *

## سەرنجێکی یەکتاناسی لە وشەی: (هُوَ)دا

باسمه سبحانه

**﴿وان من شئ الاّ يسبح بحمده﴾**

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بە جۆرێکی کتوپڕی و لە گەشتێکی بیرەکی و ئەندێشەیی و، لە کاتی موتالاّ کردنی لاپەڕەی "هەوا" تەنها لە لایەنە ماددی‌یەکەی‌دا، سەرنجێکی جوانی "یەکتایی"م لە وشەی "هُوَ"ی: **﴿لا إله إلاّ هو﴾** و **﴿قل هو الله أحد﴾**دا بینی. لەم سەرنجەوە بۆم دەرکەوت کە: ڕێی "ئیمان" ڕێ‌یەکی ئەوەندە ئاسانە کە پێویستە بگیرێتە بەر، بەلاّم ڕێی "گومڕایی" و "هاوەڵ بڕیاردان" هێندە مەحاڵ و گیروگرفتی تێدایە کە هیچ کەسێك ناتوانێت بیگرێتە بەر.

وا بە ئاماژەیەکی یەکجار کورت، ئەو سەرنجە جوان و درێژ و فراوانە ڕوون دەکەمەوە:

بەڵێ، دەکرێ مشتێك گڵ (خاك) ببێت بە جێی سەوزبوونی سەدان گوڵ و ڕووەك، گەر یەك لە دوای یەك تیای‌دا بڕوێنرێن. جا ئەگەر ئەم کارە بە "سروشت" و "هۆکارەکان" بسپێررێت، ئەوا دەبێ سەدان، بگرە بە ئەندازەی ژمارەی گوڵەکان، کارگەی بچووك لەو مشتە گڵەدا بن.. یان هەریەك لە گەردیلەکانی ئەو مشتە گڵە بینا و پێکهاتن و تایبەتکاریی ئەو گوڵە جۆراوجۆرانە و ئەندام و کۆئەندامە زیندەکانیان بزانێت، واتە خاوەنی زانستێکی گشتگیر و توانستێکی ڕەهای چەشنی زانست و توانستی خوای گەورە بێت!

"هەوا"یش کە یەکێکە لە عەرشەکانی فەرمان و ویستی خوای گەورە، بە هەمان جۆرە. چونکە هەموو بەشێك لە بەشەکانی "هەوا" و "سروە" و "با" تەنانەت ئەو هەوایەی کە لە بەشێکی کەمی هەناسەی مرۆڤدایە کاتێ وشەی: "هُوَ"ی لە زار دەردەچێت، چەندەها کار و فرمانی لەژمارەبەدەری لە ئەستۆدایە و هەموویشیان ئەنجام دەدات. جا ئەگەر ئەم کار و فرمانانە بە "سروشت" و "ڕێکەوت" و "هۆکارەکان"ی بسپێررێت، ئەوا دەبێ ئەو

هه‌وایه یان چه‌نده‌ها مه‌ڵبه‌ندی په‌خش و وه‌رگرتنی بچووكـی تێدا بێـت بـۆ هـه‌رچی ده‌نگ و گفتوگـۆی برووسـكه و ته‌لـه‌فۆن و ڕادیـۆ و هـه‌رچی جـۆری ده‌نگـی قسـه و گفتوگـۆ له‌ژماره‌به‌ده‌ره‌كانی دنیا هه‌ن و، بیشتوانێت له یه‌ك كاتدا هه‌موو ئه‌و كار و فرمانانه جێ‌به‌جێ بكـات.. یـان ئـه‌و كه‌مـه هه‌وایـه‌ی كـه لـه وشـه‌ی "هُـوَ" و گشـت ته‌نۆلكه و به‌شێك لـه به‌شه‌كانی و هه‌موو یه‌كێ له گه‌ردیله‌كانی‌دا هه‌یه، به ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی هـه‌موو ئه‌وانـه‌ی كـه لـه ته‌لـه‌فۆندا قسـه ده‌كـه‌ن و برووسـكه جۆراوجۆره‌كـان لـێ ده‌ده‌ن و بـه ڕادیۆكـان وتـه و گـوفتاریان بڵاو ده‌كـه‌نه‌وه، به‌و ئه‌ندازه‌یه خاوه‌نی كه‌سێتیی مه‌عنـه‌وی و توانا و قابیلییـه‌ت بن و، ئنجا زمان و له‌هجه‌ی یه‌ك به یه‌كیان بزانن و لـه هـه‌مان كاتیشـدا ئـه‌و زمـان و له‌هجانـه فێری گه‌ردیله‌كانی تریش بكه‌ن تاكو ئه‌و وتانه بڵاو بكه‌نه‌وه و بیانگه‌یه‌نن!! چونكـه به‌شێكی ئه‌م حاڵه‌مان له به‌رده‌مدایه و به چاو ده‌یبینین و، هه‌موو ته‌نۆلكه و به‌شه‌كانی هه‌وا خاوه‌نی ئه‌و توانا و لێهاتن و قابیلییه‌ته‌ن.

كه‌واته نه‌ك ته‌نها یـه‌ك دانـه مـه‌حاڵ، به‌ڵكو بـه ئـه‌ندازه‌ی ژمـاره‌ی گه‌ردیلـه‌كانی "هـه‌وا" مه‌حاڵ و گیروگرفتی له‌ژماره‌به‌ده‌ر له ڕێی كوفری ماددی‌یه سروشتی‌یه‌كاندا هه‌یه!

به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئه‌م كاره به ده‌ستی به‌دیهێنه‌ری مـه‌زن بسـپێررێت، ئـه‌وا ئـه‌و هه‌وایـه و هـه‌موو گه‌ردیله‌كانی ده‌بن بـه سـه‌ربازی گوێڕایـه‌ڵ و چـاوه‌ڕێی وه‌رگرتنـی فـه‌رمان. ئیـتر ئـه‌و كاتـه هه‌موو گه‌ردیله‌كانی هه‌وا: بـه ئیـزن و هێزی به‌دیهێنـه‌ریان و، بـه بۆنـه‌ی نیسـبه‌تیان بـۆ لای و پشت به‌ستنیان پێی و، بـه‌هۆی دره‌وشـانه‌وه‌ی كتوپڕیـی هـه‌وره تریشـقه ئاسـا و یـه‌ك لـه دوای یه‌كی توانستی ئه‌و به‌دیهێنه‌ره‌یان و، به‌وپـه‌ڕی ئاسـانیی چه‌شـنی ئـه‌وه‌ی كـه یـه‌ك گه‌ردیلـه‌یان ته‌نـها یـه‌ك دانـه لـه فرمانـه‌كانی جێ‌بـه‌جێ بكـات و، وه‌ك ئاسـانیی وتنـی وشـه‌ی: "هُـــوَ" و هـاتوچۆی هـه‌وا لـه‌و وشـه‌یه‌دا.. ئـه‌و هه‌وایـه و هـه‌موو گه‌ردیلـه‌كانی، بـه‌و ڕاده و ئه‌ندازه‌یـه سه‌رجه‌م كار و فرمانه هه‌مه‌كی و جۆراوجۆره له‌ژماره‌به‌ده‌ره‌كانی خۆیان جێ‌به‌جێ‌ده‌كه‌ن.

واتـه ئـه‌و كاتـه "هـه‌وا" ده‌بێـت بـه لاپه‌ڕه‌یـه‌كی فـراوان بـۆ نووسـینه ڕێـك و نـاوازه و له‌ژماره‌به‌ده‌ره‌كانی قه‌ڵه‌می توانستی خوای گـه‌وره و، گه‌ردیلـه‌كانیش ده‌بـن بـه نووكـی ئـه‌و قه‌ڵه‌مـه و، كاروفرمـانی گه‌ردیلـه‌كانیش ده‌بن بـه نوختـه‌ی نووسـینه‌كانی قه‌ڵـه‌می توانسـتی خواوه‌ند. له‌به‌ر ئه‌وه، ئه‌نجامدانی هه‌موو كاره‌كانیان بـه ئـه‌ندازه‌ی ئـه‌نجامدانی هه‌ڵسوكه‌وتی ته‌نها یه‌ك دانه گه‌ردیله‌یان ئاسان ده‌بێت.

ئەم ڕاستی‌یەم بە تەواوی و ڕوونی و بە "عین الیقین" چاوپێ کەوت، کاتێ لە گەشتە فیکری‌یەکەمدا سەیر و موتالای جیهان و لاپەڕەی هەوام دەکرد و، بیرم لە: ﴿لا إلــه إلاّ هو﴾ و ﴿قل هو الله أحد﴾ دەکردەوە.

هەروەها بە "علم الیقین" زانیم کە بەڵگەیەکی ڕوون لەسەر "یەکتایی" خوای گەورە هەیە لەو نەختە هەوایەی کە تێکەڵی وشەی "هُوَ" دەبێت، هەروەك لە واتا و ئاماژەی وشەی "هُوَ"دا درەوشانەوەیەکی "تەنیایی" خواوەند لەوپەڕی ڕووناکی‌دا و، بەڵگەیەکی "یەکتایی" لەوپەڕی بەهێزی‌دا هەیە. چونکە نیشانەی: ئاماژەی ڕەها و نەزانراو لە ڕاناو(ضمـــیر)ی "هُوَ"دا هەیە. واتە: ئایا ئەو "هُوَ"یە بۆ کێ دەگەڕێتەوە؟

ئیتر ئەو کاتە تێ گەیشتم کە بۆچی قورئانی پیرۆز و زیکرخوێنان لە مەقامی "یەکتاناسی"دا ئەم وشەیە دووپات دەکەنەوە.

بەڵێ، ئەگەر کەسێك بیەوێت یەك "خاڵ" لە شوێنێکی تایبەتیی پەڕەکاغەزێکی سپی‌دا دابنێت، دەتوانێت بەوپەڕی ئاسانی ئەم کارەی ئەنجام بدات. بەڵام ئەگەر داوای لێ بکرێت: لە یەك کاتدا چەندین "خاڵ" لە چەند جێ‌یەکی جیا جیادا دابنێت، ئەوا کارەکە ئاڵۆزی و گیرو گرفتی تێ‌دەکەوێت و بۆی ئەنجام نادرێت.. کەچی دەبینین زیندەوەرێکی بچووك لە تەنها یەك کاتدا کۆڵی قورسی چەندین کاروباری جیاجیا هەڵدەگرێت، کە دەبوو بەمە ڕێساکەی تێکەڵ و پێکەڵ ببوایە و، لەگەڵ هاتنەدەرەوەی چەندین وشەی زۆر لە یەك کاتدا و ڕۆیشتنیان بە یەکەوە بۆ ناو گوێ‌کان، ئەو ڕێسایە پەرش و بڵاو و پەرتەوازە ببوایە..

بەڵام من بە "عین الیقین" و بە بەڵگەی وشەی "هُوَ" کە بوو بە کلیل و قیبلەنمایەك بۆم، بینیم کە هەزاران خاڵ و پیت و وشەی جۆراوجۆر لەسەر هەموو بەشێك لە بەشەکانی هەوا - کە بە بیر گەشتی تێدا دەکەم - دادەنرێن، یاخود دەکرێ تیایاندا دابنرێن. تەنانەت دەگونجێ هەموو ئەمانە لە ئەستۆی تەنها یەك گەردیلە دابنرێن، بێ ئەوەی هیچ تێکەڵی و تێهەڵکێش بوون و ڕێسا تێکچوونێك ڕووبدات.

دەبێ ئەوەش بزانین کە جگە لەم کارانەی باسمان کردن، ئەم گەردیلەیەی هەوا چەندین کار و ئەرکی زۆری تریش لە هەمان کاتدا ئەنجام دەدات و هیچ کارێکیانی لێ تێك ناچێت و، چەندەها کۆڵی قورسی لەسەر شان دادەنرێت بێ ئەوەی هیچ جۆرە لاوازی و تەمبەڵی‌یەك دەربڕێت، ئەوەتا هەمیشە ڕێسای خۆی دەپارێزێت و هەرگیز نایبینین لە ئەنجامدانی کار و ئەرکە جۆراوجۆرەکانی سەرشانی‌دا کەمتەرخەمی بنوێنێت، چونکە

هه‌زاران هه‌زار وشه و ده‌نگی جیاجیا و جۆراوجۆر ده‌ڕۆنه ناو ئه‌و گه‌ردیلانـه‌وه و بـه هـه‌مان جۆریش لێیان ده‌چنه ده‌ره‌وه، بێ ئه‌وه‌ی تێكه‌ڵی یه‌كتر بن و سـه‌ر لـه یـه‌كتر تێـك بـده‌ن. وه‌ك بڵێی ئـه‌و گه‌ردیلانـه خـاوه‌نی چـه‌ندین گوێـی بیسـه‌ری بچووكـی بـه ئه‌ندازه‌ی خۆیـان بـن و گه‌لـێ زمانی وردی بچووكیان ببێت كه له‌گه‌ڵ خۆیاندا له‌بار و شیاو بن و، له‌و رێیه‌وه ئـه‌و وشانه بچنه ناو ئه‌و گوێیانه‌وه و لـه‌و زمانه وردانه‌شه‌وه ده‌ربچن.

سـه‌ره‌ڕای ئـه‌م هـه‌موو كاروبـاره سـه‌یرانه‌ش، هـه‌موو گه‌ردیله‌یـه‌ك و هـه‌موو به‌شـێك لـه به‌شه‌كانی "هه‌وا" به‌وپه‌ڕی سه‌ربه‌ستی ده‌جووڵێن و به زمانی حاڵ و له كاتی كه‌یف و شادیی (جه‌زبه و حاڵ)دا زیكری به‌دیهێنه‌ری خۆیان ده‌كه‌ن و به زمان و شایه‌تی‌دانی ئه‌و ڕاستی‌یه‌ی ئێستا باسمان كرد و پڕ به ده‌م: ﴿**لا إله إلاّ هو**﴾ و ﴿**قل هو الله أحد**﴾ ده‌ڵێن.

خۆ كاتێ كه زریان و ڕه‌شه‌بای سه‌خت هه‌ڵده‌كات و، هـه‌ور نه‌عره‌تـه‌ی لـێ ده‌بێتـه‌وه و، ئاسمـانیش بـه ڕوونـاكیی هـه‌وره برووسـكه ده‌دره‌وشـێته‌وه.. ئـا لـه‌و كاتـه‌دا ڕه‌وتـی هـه‌وا ده‌گۆڕێـت و ده‌بێ به چـه‌نده‌ها شـه‌پۆلی تێكه‌ڵوپێكـه‌ڵ، كـه‌چی له‌گـه‌ڵ ئه‌وه‌شـدا و بـه هیـچ جۆرێـك ڕێسـای گه‌ردیلـه‌كان لـه كـاتی ئه‌نجامدانی كاروباره‌كانیـاندا تێـك نـاچێت و هیـچ كارێك ڕێی جێ‌به‌جێ كردنی كارێكی تـری لـێ نـاگرێت!! ئـه‌م ڕاستی‌یه‌م بـه "عـین الیقـین" چاو پێ كه‌وت.

كه‌واتـه ده‌بـێ (گـه‌ر كـاری هـه‌وا بـه سروشـت و هۆكاره‌كـان بسـپێررێت) هـه‌موو گه‌ردیله‌یه‌ك و هه‌موو به‌شێك لـه به‌شـه‌كانی "هـه‌وا" خـاوه‌نی زانسـت و دانسـت و ویسـت و هـێزی ڕه‌هـا بێـت و توانـا و ده‌سته‌ڵاتی تـه‌واوی به‌سـه‌ر گشـت گه‌ردیلـه‌كاندا ببێـت، تـاكو بتوانێت ئه‌و هه‌موو كار و فرمانه جۆراوجۆرانه به ته‌واوی جێ‌به‌جێ بكات!!

خـۆ دیـاره ئه‌مـه‌ش بـه ئه‌ندازه‌ی ژمـاره‌ی گه‌ردیلـه‌كان بـه‌تاڵ و مـه‌حاڵ و نـه‌گونجاوه و ته‌نانه‌ت هیچ شه‌یتانێكیش شتی وای له ده‌م ده‌رناچێت.

كه‌واته شتێكی ئه‌وپه‌ڕی ڕوون و ئاشكرا و به‌ڵگه‌نه‌ویسته و، ته‌نانـه‌ت بـه "حـق الیقـین" و "عین الیقین" و "علـم الیقین" ده‌زانرێت كه:

ئه‌م لاپه‌ڕه‌یه‌ی "هه‌وا" لاپه‌ڕه‌یه‌كی بگۆڕه و، به‌دیهێنـه‌ر بـه‌پێی زانیـاریی ڕه‌هـا و بـه قه‌ڵـه‌می توانسـت و قـه‌ده‌ری خـۆی، چیـی بوێـت تیـای‌دا ده‌نووسێت و به‌وپـه‌ڕی داناییـه‌وه قه‌ڵـه‌می خـۆی تێدا تاو ده‌دات.. هـه‌وا لاپه‌ڕه‌یه‌كه وه‌ك له‌وحێكی كوژانه‌وه و تیانووسـین(لوح المحو

والإثبات) وایـە بۆ کاروبـارە نـووسـراوەکانی ناو: "لوح المحفوظ" لەنـاو جیهـانی پڕ لـە ئالوگۆڕی دنیادا.

هـەروەك "هـەوا" بـەم کاروبـارە سەرسـووڕهێنەرانەی بـاس کـران بەڵگەیـە لەسـەر درەوشانەوەی "یەکتایی" خوای گەورە لە کاتی ئەنجامدانی تەنها یەك دانە ئەرکی سەرشانیدا کە گواستنەوەی دەنگەکانـە و، لـە هـەمان کاتیشـدا مەحاڵـە لەژمارەبـەدەرەکانی "ڕێـی گومڕایی" ڕوون دەکاتەوە.. هەروەك هەوا ئەم کارانە ئەنجام دەدات، لە هەمان کاتدا چەندین کاروباری لەوپەڕی گرنگی و ڕێکوپێکـیدا و بێ هیـچ تێکـەڵ بـوون و لـێ تێکچوونێکیش جێبـەجێ دەکـات، وەك: گواسـتنەوەی مـاددە ناسـکەکانی چەشـنی کارەبـا و بکێـش و پاڵنـەر(الجاذبـة والدافعـة) و ڕوونـاکی.. لـە هەمـان کاتیشـدا دەڕواتـە نـاو ڕووەك و گیاندارەکانیشەوە لە ڕێی هەناسەدانیانەوە و لـەوێیش بەوپـەڕی وردی و ڕێکوپێکـی چـەندین کاری سەبارەت بە ژیانی ئەو ڕووەك و زیندەوەرانە جێبەجێ دەکـات.. هـەروەها لـە هـەمان کاتدا ئەرکی پیتاندنی ڕووەك دەخاتـە ئەستۆیەوە و.. چـەندەها کـار و فرمـانی تـری بنـەڕەتیی وەك ئەمانە ئەنجام دەدات.

ئەمانە بە دڵنیایییـەکی تـەواوەتی دەیچەسپێنن کـە: "هـەوا" عەرشـێکی مـەزنی وەهایـە بـە فەرمان و ویستی مەزنی خوای گـەورە دەجووڵـێتەوە و، بـە "عین الیقـین" دەیچەسپێنێت کـە هەرگیزاو هەرگیز هیچ گریمانێك لە کایەدا نییە بۆ ئەوەی "ڕێکـەوتی کتوکوێر" و "هۆکـارە بـەرەڵا" و "مـاددە کۆڵـەوار و بێ گیـان و ژیانـەکان" دەستیان لـەو نووسـینە بێ وێنەیـەی ئـەو لاپەڕەیەی "هەوا" و لە ئەنجامدانی کارەکانیدا ببێت..

بەمەی پێشـوو، تا ڕادەی "عین الیقـین" قەناعـەتی تـەواوم پـەیدا کـرد و زانیـم کـە: هـەموو یەکێك لە گەردیلەکانی هەوا، بە زمانی حاڵی خۆیان، هەردەم **﴿قل هو الله أحد﴾** و **﴿لا إلـه إلاّ هو﴾** دەڵێنەوە.

هەروەك بەم کلیلە - واتە کلیلی: "هُوَ" - ئەم هەموو کاروبـارە سـەیرانەم تەنـها لـە ڕووە ماددییەکەی هەوادا بینی، تێکڕای توخـمی هـەوایش بـە گشـتی لـە بـەرچاومدا وەك وشـەی "هُوَ"ی لـێ هات و، بوو بە کلیلێك بۆ جیهانی مـەعنا و میسـال. چونکـە بـۆم دەرکـەوت کـە جیـهانی میسـال[1] وەك کامێرایـەکی یـەکجار مـەزن وایـە، لـە یـەك کـاتدا چـەندەها وێنـەی

(١) لێرەدا بە کورتی بـاس کـرا، چونکـە بـارودۆخی دەوروبـەرمان دەرفـەتم نـادات لەگـەڵ بەڵگـە گومانبڕەکـانیدا ڕوونی بکەمەوە. (دانەر)

له‌ژماره‌به‌ده‌ری هه‌رچی ڕووداوی دنیا هه‌یه ده‌گرێت، بێ ئه‌وه‌ی ئه‌و وێنانه تێکه‌ڵی یه‌کتر ببن یان تێك بچن و بئاڵۆزێن. به ڕاده‌یه‌ك که ئه‌م جیهانی میساله چه‌ندین دیمه‌نی مه‌زن و فراوانی دوارۆژی به ئه‌ندازه‌ی هه‌زاران هه‌زار دنیای تێدا کۆ بووه‌ته‌وه، که چه‌ندین بارودۆخی فانیی چه‌ند بوونه‌وه‌رێکی "فانی" و به‌رهه‌می ژیانی سه‌رپێیی ئه‌وان له چه‌ندین دیمه‌ن و تابلۆی نه‌مر و به‌رده‌وام و له به‌ردەم ئه‌هلی به‌هه‌شت و به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشه‌یی و له چه‌نده‌ها پیشانگای هه‌تاهه‌تاییدا، پیشان ده‌دات. به‌م کاره‌ش ڕووداوه‌کانی دنیا و یادداشته جوانه‌کانی ڕابوردوویان یاد ده‌خاته‌وه.

به‌ڵگه‌ی بێ گومانیش له‌سه‌ر بوونی "لوح المحفوظ" و جیهانی میسال و نموونه‌ی بچووکی ئه‌م دوانه: هێزی پارێزکاری ناو که‌لله‌سه‌ری مرۆڤ و توانای ئه‌ندێشه‌یه‌تی. چونکه هه‌رچه‌ند ئه‌م دوانه ئه‌وه‌نده بچووکن جێی تۆوه خه‌رته‌له‌یه‌کیش ناگرن، که‌چی کاروباره‌کانیان به ته‌واوی و بێ تێکه‌ڵ بوون و لێ تێکچوون و به‌وپه‌ڕی ورده‌کاری و ڕێکی جێبه‌جێ ده‌که‌ن، به ڕاده‌یه‌ك که ده‌ڵێی هه‌ریه‌که‌یان کتێبخانه‌یه‌کی پڕ له زانیاری و به‌ڵگه‌نامه‌یان تێدایه. ئه‌مه‌ش بۆمان ده‌چه‌سپێنێت که ئه‌م دوو هێزه‌ی مرۆڤ، دوو نموونه‌ی بچووکی "لوح المحفوظ" و "جیهانی میسال"ن.

به‌م جۆره و به "علم اليقين" زانرا که: "هه‌وا" و "ئاو" به تایبه‌ت شله‌ی "مه‌نی"، که دوو توخمی ئه‌وتۆن گه‌لێ زیاتر له خۆیان ده‌بن به به‌ڵگه له‌سه‌ر بوونی خوای گه‌وره (وه‌ك له سه‌ره‌تای ئه‌م بابه‌ته‌وه باس کرا).. زانرا که ئه‌م دوانه دوو لاپه‌ڕه‌ی فراوانن قه‌ڵه‌می توانست و دانست نووسینێکی دانایانه و ڕه‌وانیان تێدا ده‌نووسن و، ویست و، قه‌ڵه‌می قه‌ده‌ر و، توانستی خواوه‌ندیش تیایاندا ده‌گه‌ڕێن و دێن و ده‌ڕۆن و.. ئیتر ده‌ست تێوه‌ردانی "ڕێکه‌وت" و "هێزی کتوکوێر" و "سروشت"ی که‌ڕ و "هۆکار"ه به‌ربادە بێ گیانه‌کان له‌و نووسینه پڕ له داناییه‌دا، کارێکی سه‌د له سه‌د مه‌حاڵ و نه‌شیاو و نه‌گونجاوه.

(پاشماوه‌ی ئه‌م باسه له کاتی ئێستادا نه‌نووسرا)!

هه‌زار هه‌زار سڵاو بۆ هه‌موان

# وتەی چواردەهەم

بسم الله الرَّحـــمن الرَّحيم

﴿الر كِتابٌ أُحْكِمَتْ آياتُهُ ثمّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَكيمٍ خَبيرٍ﴾ (هود:١)

**لەم وتەیەدا ئاماژە بۆ چەند نموونەیەکی بەشێك لە ڕاستیـیە بـەرز و بڵندەکـانی قورئانی حەکیم و تەفسیرە ڕاستەقینەکەی دەکەین کە فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ، تاکو ئەم ئاماژانە ببن بە چەند پلیکانەیەك مرۆڤ بە هۆیانەوە سەر بکـــەوێت و بەو ڕاستـیـیانە شـاد ببێت و، بە هانای ئەو چەشنە دڵ و دەروونانەشەوە بڕوات کە لە بواری ملکەچی و تەسلیم بووندا دەسـتمایە و توێشووی کەمیان پێیە. ئنجا لـە کۆتایی وتەکەشدا دەرسێکی پـەند و ئامۆژگـاری و نهێنیـیـەکی چـاودێریی خـوای گەورە، دەخەینە ڕوو.**

**لێرەشدا، تەنها نموونە بۆ پێنج دانەی ئەو ڕاستیـیە مەزنانە دەهێنینـــەوە، چونکـە لە وتەی دەهەمدا - بە تایبەت لـە ڕاستیی نۆهەمیدا - ئەو نموونانە باس کراون کـە تایبەتن بە حەشر و قیامەتەوە و، پێویست بە دووپات بوونەوە ناکات.**

**○ مەسەلەی یەکەم:**

بـۆ نموونـە ئـەم ئایەتـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿خَلَـقَ السَّـمواتِ والأرْضَ في سِـتَّةِ أيّـامٍ﴾ (الأعراف:٥٤). واتە: ئاسمانەکان و زەویمان لە شەش ڕۆژدا بەدی هێناوە..

ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دنیای مرۆڤ و جیـهانی زینـدەوەران شـەش ڕۆژ لـە ڕۆژەکـانی قورئان دەژین، کە زەمان و کاتێکی درێژخایەنە و لەوانەیە وەك هەزار یان پـەنجا هـەزار سـاڵی ئاسایی بخایەنێت.

جا بۆ ئـەوەی دڵـی مـرۆڤ دڵنیـایی و قەناعـەتی تـەواوی بەرامبـەر بـەم ڕاستـیـیە بـەرزە بـۆ دروست ببێـت، ئـەوا ئـەو جیـهان و بوونـەوەر و دنیـا ڕێبـوارە کـاتی وبـە لـێشـاوانە دەخەینـە پێش‌چاو کە بەدیهێنەری مەزن لە هـەموو ڕۆژ و هـەموو سـاڵ و هـەموو چـەرخێکدا - کـە لـە حوکمی یەك ڕۆژدایە - بەدی‌یان دەهێنێت.

بەڵێ ڕاستە، دنیاکـانیش - وەکـو خـەڵکی - چـەند میوانێکی ڕێبـوارن لـێرەوە گـوزەر دەکەن و بە فەرمانی بەدیهێنەری مەزن لە هەموو وەرزێکدا جیهانیان لـێ پڕ دەکرێت و پاشان لێیان خاڵی دەکرێتەوە.

○ **مەسەلەی دووهەم:**

بۆ نموونە ئەم ئایەتانە:

**﴿وَلا رَطْبٍ وَلا يابسٍ إلاّ في كِتابٍ مُبين﴾** (الأنعام:٥٩).

**﴿وكُلَّ شَيْءٍ أحْصَيْنَاهُ في إمامٍ مُبين﴾** (يس:١٢).

**﴿لا يَعزُبُ عَنهُ مِثْقالُ ذَرَّةٍ في السَّمواتِ وَلا في الأَرْضِ وَلا أَصْغَرَ مِنْ ذلِكَ وَلا أَكْبَرَ إلاّ في كِتابٍ مُبين﴾** (سبأ:٣).

هەروەها ئایەتە پیرۆزەکانی تری هاوچەشنیان، ئەوە دەگەیەنن کە:

هەرچی شت هەیە، چ لە پێش و چ لە پاش "بوون"یان، هەموویان "نووسراو"ن.

بۆ ئەوەی دڵی مرۆڤ لەم باوەڕەدا بگاتە دڵنیایی تەواو، ئەمەی خوارەوەی دەخەینە پێش‌چاو:

بەدیهێنەری نەخشەکێشی مەزن، بە چەشنێکی مەعنەوی، پێڕستی بوون و مێژووی ژیان و پرۆگرامی کارەکانی چەندەها بەدیهاتووی ڕێکوپێك لە بنەچە و ناوك و تۆوی ئەو بوونەوەرانەدا تۆمار دەکات و دەیانپارێزێت، هەرچەندەش هەموو وەرزێك - بە تایبەتی بەهار - لەسەر ڕووی لاپەڕەی زەوی‌دا ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت. هەروەك دوای نەمانی ئەو بوونەوەرانەش بەدیهێنەری مەزن، بە چەشنێکی مەعنەوی، لەناو بەروبووم و تۆوە وردەکانیاندا بە قەڵەمی قەدەری خۆی تۆماریان دەکات، تەنانەت تەڕ و وشکی بوونەوەرانی بەهاری پێشوو بەوپەڕی وردەکاری لە تۆوە ڕەق و دیاریکراوەکانیاندا دەنووسێت و بەوپەڕی ڕێکوپێکی دەیانپارێزێت. دەڵێی وەرزی بەهار وەك گوڵێکی یەکجار جوان و ڕێك و ناوازەیە، دەستی خواوەندی مەزن و خاوەنی جوانی لەسەر گوڵدانی گۆی زەوی دایناوە و پاشان لێی دەکاتەوە.

جا مادەم ڕاستی ئەمەیە، ئایا ئیتر جێی سەرسووڕمان نی‌یە کە مرۆڤ گرفتاری گومڕایی‌یەکی وا سەیر و سەمەرە ببێت کە ناوی "سروشت" لەم نووسینە فیتری و وێنە ناوازەیە و لەم دانستە کارتێکراوە بنێت کە لەسەر ڕووی سەرانسەری زەوی‌دا نەخشاون و ڕەنگدانەوەی یەك درەوشانەوەی نووسینەکانی (لوح المحفوظ)ن کە لاپەڕەی تیانووسینی قەدەری خوای گەورەیە؟! ئایا جێی سەرسووڕمان نی‌یە کە مرۆڤ باوەڕی بە "سروشت" ببێت و پێی وابێت کاریگەریی هەیە و سەرچاوەیەکی خوڵقێنەرە؟

ئایا ئەم ڕاستی‌یە ڕوونە لە کوێ و گومانی بێ‌ئاگایانیش لە کوێ؟

دیارە جیاوازیی نێوانیان وەك هی نێوان زەوی و ئاسمان وایە!

○ مەسەلەی سێهەم:

بۆ نموونە، هەواڵدەری ڕاستگۆ ﷺ شێوەی مەلائیکەتانی هەڵگری عـەرش و مەلائیکـەتانی هەڵگری زەوی و ئاسمانەکان و گەلێ مەلائیکەتی تری بە جۆرێك کێشاوە کە ئەو مەلائیکەتە چل هەزار سەری هەیە و هەریەك لەم سەرانەش چل هەزار زمانیان تێدایە کە هـەر یەکـەیان بـە چل هەزار جۆر تەسبیحاتی خوای گەورە دەکەن..

ئەم ڕاستییە بەرزەی کە لەم چەشنە فەرموودە پیرۆزانەدا هەیە، ڕێکوپێکـی و هەمـەکێتی و گشتلایەنیی پەرسـتشی مەلائیکەتان دەردەبڕێت. جا بۆ ئەوەی بـۆ لای ئـەم ڕاسـتییە بڵنـدە سەربکەوین و بەرز ببینەوە، ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوە پێشچاو دەخەین و داوا لـە خوێنـەر دەکەین کە بە وردی سەرنجیان بدات و بیریان لـێ بکاتەوە، کە ئەمانەن:

﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّموات السَبْعُ والأَرْضُ وَمَنْ فيهِنّ﴾ (الإسراء:٤٤).

﴿إنَّا سَخَّرْنا الْجبالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بالْعَشِيِّ والإِشْراق﴾ (ص:١٨).

﴿إنَّا عَرَضْنا الأَمانَةَ عَلَى السَّموات وَالأَرْضِ والْجبال..﴾ (الأحزاب:٧٢).

هەروەها ئایەتەکانی تری هاوچەشنیان، بە ڕاشکاوی ڕایدەگەیەنن کە:

گەورەترین و فراوانترین بوونەوەر تەسبیحاتێکی تایبەتیی وەها بـۆ خـوای گـەورە دەکـات کە لەگەڵ فراوانـی و هەمـەکێتی و مەزنییەکـەیدا بگونجێ. ئەمـەش شـتێکی ئاشـکرایە و لـە پێشچاودایە. ئەوەتا ئاسمانە بـەرین و گـەورەکان سـەرگەرمی تەسبیحاتن بـۆ خـوای گـەورە. وشەکانی ئـەو تەسبیحاتەشـیان بریتـین لـە: خـۆر و مـانگ و ئەسـتێرەکانیان.. هـەروەك گـۆی زەویـش، کـە وەك بـاڵندە بـە بۆشـایی ئاسمـاندا دەفڕێـت، سـەرگەرمی حـەمد و تەسـبیحاتە بـۆ خواوەند، ئەو وشانەش کە ئەم حەمد و تەسبیحەیان پێ دەردەبڕێـت بریتـین لـە: زینـدەوەران و ڕووەك و درەختەکان.

بەو واتایەی کە هەموو درەخت و ئەستێرەیەك - وەك گۆی زەوی - خـاوەنی تەسـبیحاتی جوزئی و تایبەتیی خۆیەتی. ئـەم تەسـبیحاتەی گـۆی زەوی هەمەکییـە و، تەسـبیحی هـەموو بەش و پارچەیەك و تەنانەت گشت چیا و شیو و دۆڵێك و هـەموو وشـکایی و دەریایـەکی نـاو زەویی لەخۆ گرتووە.

جا هەروەك گۆی زەوی بـە هەمـەکێتیی خـۆی و بـەو بەشـانەی لێـی پێکـهاتووە، خـاوەنی تەسبیحاتی تایبـەتیی خۆیـەتی، بـە هـەمان جـۆر ئاسمانـەکان و سـەرجەم بـورج و خولگـەی ئەستێرەکانیشی، خاوەنی تەسبیحاتی تایبەتی و هەمەکیی خۆیانن.

بێ گومان ئـەم زەوییـەی کـە بـەم جۆرە هـەزاران سـەری هەیـە و هەریـەك لـەم سـەرانەش

سه‌دان هه‌زار زمانی تێدایه‌، ده‌بێ مه‌لائیكه‌تێكی سه‌رپه‌رشتیكاری بۆ ده‌ستنیشان كرابێت كه‌ له‌گه‌ڵ ئه‌م شێوه‌یه‌ی‌دا گونجاو بێت و گوڵزار و به‌روبوومه‌كانی حه‌مد و ته‌سبیحاتی زه‌وی، كه‌ زیاد له‌ سه‌د هه‌زار جۆری ته‌سبیح و ته‌حمید ده‌بن، له‌ جیهانی "میسال"دا ده‌ربخات و له‌ جیهانی "ڕۆح"یشدا ببێت به‌ نوێنه‌ریان و له‌وێ‌دا ڕایانبگه‌یه‌نێت.

چونكه‌ ئه‌گه‌ر چه‌ند شتێكی جیاجیا كۆ ببنه‌وه‌ و بچنه‌ شێوه‌ی كۆمه‌ڵێكه‌وه‌، ئه‌وا كه‌سایه‌تی‌یه‌كی مه‌عنه‌وی بۆ خۆیان پێكده‌هێنن، خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌و كۆمه‌ڵه‌ پێكهاتووه‌ تێكه‌ڵی یه‌كتری ببن و یه‌ك بگرن، ئه‌وا كه‌سایه‌تی‌یه‌كی مه‌عنه‌ویی وایان بۆ دروست ده‌بێت كه‌ نوێنه‌رایه‌تی‌یان ده‌كات و به‌ وێنه‌ی جۆره‌ گیانێكی مه‌عنه‌وی و مه‌لائیكه‌تێكی سه‌رپه‌رشتیكار ئه‌ركی ته‌سبیحاتی ئه‌و كۆمه‌ڵه‌ ده‌گرێته‌ ئه‌ستۆ..

بۆ نموونه‌: ئه‌م دره‌ختی په‌ڵكه‌ سێ په‌له‌ی به‌رده‌م ژووره‌كه‌مان نوێنه‌ری "وشه‌"یه‌كی مه‌زنه‌ كه‌ "زمان"ی ئه‌م شاخه‌ی ناو ده‌می "بارلا" ده‌ری ده‌بڕێت. فه‌رموو سه‌یری بكه‌، ئایا نابینیت هه‌ریه‌ك له‌و سێ سه‌ره‌ی ئه‌م دره‌خته‌ سه‌ده‌ها په‌ل(زمان)یان هاویشتووه‌ و هه‌ریه‌ك له‌و زمانانه‌ش سه‌دان به‌ری هاوسه‌نگ و ڕێكوپێكی "وشه‌"یان گرتووه‌ و، هه‌ریه‌ك له‌و به‌روبوومانه‌ش سه‌دان تۆوی بچووك و باڵداری "پیت"یان تێدایه‌؟!

ئایا هه‌ریه‌ك له‌م سه‌ر و زمانانه‌ به‌ گوفتارێكی ڕوون و ستایشێكی ئاشكرا و ڕه‌وان، كه‌ ده‌ڵێی به‌ چاو ده‌یبینیت و به‌ گوێ ده‌یبیستیت، ته‌سبیحات بۆ ئه‌و خواوه‌نده‌ ناكات كه‌ خاوه‌نی هه‌موو موڵكێكه‌ و دارای فه‌رمانی: "كن فیكون"ه‌؟!

جا ئه‌و مه‌لائیكه‌ته‌ی كه‌ سه‌رپه‌رشتیكاری ئه‌م دره‌خته‌یه‌، ده‌بێ له‌ جیهانی مه‌عنادا به‌ چه‌نده‌ها زمانی جیاجیا نوێنه‌ری ئه‌و ته‌سبیحاتانه‌ بێت. به‌ڵكو "حیكمه‌ت" داخوازی ئه‌وه‌یه‌ كه‌ له‌ ڕاستی‌دا ئه‌و مه‌لائیكه‌ته‌ ئاوه‌ها بێت!

**❍ مه‌سه‌له‌ی چواره‌م:**

بۆ نموونه‌ ئه‌م ئایه‌تانه‌:

**﴿إِنَّما أَمْرُهُ إِذا أَرادَ شَيْئاً أَنْ يَقولَ لَهُ كُنْ فَيَكُون﴾** (يس:٨٢).

**﴿وَما أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاَّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ﴾** (النحل:٧٧).

**﴿وَ نَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيهِ مِنْ حَبْلِ الوَرِيدِ﴾** (ق:١٦).

**﴿تَعْرُجُ الْمَلائِكَةُ والرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كانَ مِقْدارُهُ خَمْسينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾** (المعارج:٤).

هه‌روه‌ها ئایه‌ته‌كانی تری هاوچه‌شنیان، ئه‌م ڕاستی‌یه‌ به‌رزه‌ی خواره‌وه‌ ده‌رده‌بڕن:

خوای گه‌وره‌ی به‌توانا به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا به‌ ئاسانی‌یه‌كی ڕه‌ها و له‌ نێوان خێرایی‌یه‌كی ڕه‌هادا و بێ به‌ركه‌وتن و ده‌ست تێوه‌ردان، شتان به‌دی ده‌هێنێت، ده‌ڵێی شتان

تەنها بە "فەرمان" دێنە بوون و بەدی دەهێنرێن..

پاشان ئەو بەدیهێنەرە مەزنە تابلێی لە بەدیهاتووانیەوە نزیکە، کەچی بەدیهاتووان لەوپەڕی دووریدان لەو خواوەندەوە..

پاشان هەرچەندە خاوەنی گەورەیی(کبریاء)یەکی ڕەهایە، کەچی بێنرخترین و هەندەکیترین شت فەرامۆش ناکات و وردەکاریی بەدیهێنانی پێ دەبەخشێت.

ئەم ڕاستییەی کە قورئان ڕایگەیاند، بەڕێوەچوونی تەواو ئاسان و ڕێکوپێکیی تەواو کامڵی بوونەوەران شایەتیی لەسەر دەدات و، ئەم نموونەیەی خوارەوەش نهێنیی حیکمەتەکەی دەردەخات:

بۆ نموونە - ولله المثل الأعلى - ئەو کارانەی کە بە فەرمان و تەسخیری خوای گەورە لە ئەستۆی "خۆر" نراون - ئەو خۆرەی کە دەوری ئاوێنەیەکی چڕ دەبینێت بۆ ڕەنگدانەوەی ناوی جوانی "النور"ی خوای گەورە - بەم جۆرەی خوارەوە ئەم حەقیقەتە قورئانییە لە تێگەیشتنەوە نزیك دەخەینەوە:

"خۆر" هەرچەندە بەرز و بڵندە کەچی تابلێی لە ماددە ڕوون و بریسکەدارەکانەوە نزیکە، تەنانەت زیاتر لە خۆیان لەو شتانە نزیکترە! ئنجا هەرچەندە خۆر بە درەوشانەوە و ڕووناکی و چەند لایەنێکی کە لە کارتێداکردن دەچن، کاریگەریی خۆی لە شتاندا بەجێ دەهێڵێت، کەچی ئەو ماددە ڕوون و بریسکەدارانە بە هەزاران ساڵ لێیەوە دوورن و هەرگیز ناتوانن هیچ کارێك بکەنە سەر خۆر، تەنانەت ناشتوانن لافی نزیك بوون لە خۆر لێ بدەن!

هەروەها، لە بینینی: شکانەوەی ڕووناکیی خۆر و دەرکەوتنی وێنەکەی لە هەموو گەردیلەیەکی ڕووندا - بەپێی توانا و ڕەنگی ئەو گەردیلەیە - مرۆڤ تێدەگات کە خۆر دەڵێی لە هەموو ئەو گەردیلانەدا ئامادەیە کە ڕوویان لە خۆرە و تیشکی خۆریان پێ گەیشتووە..

هەروەها بە ئەندازەی گەورەیی "ڕووناکیی خۆر" گەورەیی گشتگیری و هەمەلایەنیی تیشکەکانیشی زیاد دەبێت، چونکە هەر تەنها "مەزنیی نوورانێتی"یە کە هەموو شتێك دەخاتە ناو گشتگیریی خۆیەوە بە ڕادەیەك هیچ شتێك - با زۆر بچووکیش بێت - ناتوانێت خۆی لێ بشارێتەوە یان لە دەستی دەرباز ببێت. واتە گەورەیی "مەزنی"یەکەی تەنانەت شتانی جوزئی و بچووکیش پشت گوێ ناخات، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموویان - بەهۆی نهێنیی نوورانێتی - لە نێوان بازنەی گشتگیریی خۆیدا کۆ دەکاتەوە.

گەر بە فەرزی مەحاڵ وا دابنێین کە خۆر لە درەوشانەوە و کارەکانی ئەستۆیدا بکەر(فاعل) و خاوەنی ویست و ئیختیار بێت، ئەوا دەتوانین تێبگەین کە کارەکانی ئەم

خۆرە – بە ئیزنی خوای گەورە – لەوپەڕی ئاسانی و خێرایی و فراوانی و هەمەلایەنیدا، هەر لە گەردیلەکانەوە تا دڵۆپە ئاوەکان و هەر لە ڕووی دەریاوە تا هەسارە گەڕۆکەکان، بەڕێوە دەبرێن و ئەنجام دەدرێن. ئەو کاتەش "گەردیلە" و "هەسارەی گەڕۆك" بەرامبەر فەرمانی خۆر یەکسان دەبن، چونکە ئەو ڕێژنەی ڕووناکییەی کە بەسەر ڕووی دەریادا پەخشی دەکات، بەوپەڕی ڕێکوپێکی بە گەردیلەشی دەبەخشێت، هەریەکەیان بەگوێرەی توانا و لێهاتنی خۆیان.

جا ئەم خۆرەی کە بڵقێکی یەکجار بچووك و ڕووناك و بریسکاوەی ڕووی دەریای ئاسمانە و ئاوێنەیەکی بچووك و چڕی درەوشانەوەی ناوی "النور"ی ئەو خواوەندەیە کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.. ئەم خۆرە، نموونەکانی هەر سێ بناغەکەی ئەم "ڕاستی"یەی قورئان دەردەخات، چونکە گومان لەوەدا نییە کە ڕووناکی و گەرمیی خۆر چەشنی خاك(گڵ) بە چڕ و پڕ دادەنرێت لەچاو زانست و توانستی ئەو کەسەی کە: (نور النور ومنور النور ومقدر النور)ە!

کەواتە: ئەو خواوەندە مەزن و خاوەن جوانییە، بە زانست و توانستی خۆی و بە جۆرێکی ڕەها، لە هەموو شتێکەوە نزیکە و چاوی لێیەتی و لە لای ئامادەیە، بەڵام هەموو شتان بە جۆرێکی ڕەها لەو خواوەندە دوورن..

هەروەها بێ ماندووبوون و دەست تێوەردان و بە ئاسانییەکی ڕەها هەڵسوکەوت لە شتاندا دەکات، بە چەشنێك کە مرۆڤ هەست دەکات ئەو خواوەندە تەنها "فەرمان" دەردەکات و شتانیش هەر بەم فەرمانە و بە ئاسانی و خێراییەکی ڕەها دێنە "بوون" و بەدی دەهێنرێن..

هەروەها هیچ شتێك، با هەندەکی یان هەمەکی، بچووك یان گەورەش بێت، لە بازنەی توانستی ئەو بەدەر نییە و لە گشتگیریی مەزنێتییەکەشی دوور نییە.

بەم جۆرە لەم "ڕاستییەی قورئان" تێدەگەین و هەر بەم جۆرەش تا پلەی "شهوود" ئیمانێکی دڵنیاییبەخشمان پێی هەیە. بەڵکو دەبێ هەر ئاوەهایش ئیمانمان پێی بێت.

○ **مەسەلەی پێنجەم:**

ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوە و هاوچەشنیان، "مەزنی" و "گەورەیی" ڕەهای خوای گەورە دەردەخەن:

سەرەتا هەر لە ئایەتی: ﴿**وَما قَدَرُوا اللهَ حَقَّ قَدْرِه وَالأَرضُ جَميعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ القِيامَةِ والسَّموات مَطْوِيَّاتٌ بِيَمينِهِ**﴾ (الزمر:٦٧) تا ئایەتی: ﴿**وَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ يَحُولُ بَينَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ**﴾(الأنفال:٢٤)..

ئنجا هەر لە ئایەتی: ﴿اللهُ خالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ وَكيل﴾ (الزمر:٦٢) تا ئایەتی: ﴿يَعلَمُ ما يُسِرُّونَ وَما يُعْلِنُون﴾ (البقرة:٧٧)..

هەر لە ئایەتی: ﴿خَلَقَ السَّموات وَالأَرْضَ﴾ (الأعراف:٥٤) تا ئایەتی: ﴿خَلَقَكُمْ وَما تَعْمَلون﴾ (الصافات:٩٦)..

پاشان هەر لە ئایەتی: ﴿ما شاءَ اللهُ لا قُوَّةَ إلاّ بالله﴾ (الكهف:٣٩) تا ئایەتی: ﴿وَما تَشاؤُونَ إلاّ أَنْ يَشاءَ اللهُ﴾ (الإنسان:٣١)..

ئەم ئایەتە پیرۆزانە، هەمەلایەنگیریی سنووری "مەزنیی پەروەردگاریتی" و "گەورەیی خوایەتی"ی خوای گەورەمان سەبارەت بە هەموو شتێك بۆ دەردەخەن.

جا ئەم پادشا مەزنەی ئەزەل و ئەبەد، بە توندی هەڕەشە لەم مرۆڤە دەکات کە: لەوپەڕی کۆڵەواری و لاوازی و هەژاریدایە و جگە لە بەشێکی کەمی ویست و دەستکەوتێکی ئیختیاری نەبێ چیی تر شك نابات و هەرگیز توانای بەدیهێنانی نی‌یە.. ئایا نهێنیی ئەو زانستە چی‌یە کە ئەم سکاڵایانەی قورئان و هەڕەشە و گوڕەشە ترسێنەرەکانی خاوەندی خاوەنی "مەزنێتی"یان لەسەر بنیات نراوە بەرامبەر بەم مرۆڤە لاوازە، ئایا چۆن لەگەڵ یەکدا دەگونجێن و بەرامبەر یەکتری دەردەچن؟

**لە وەڵامدا دەڵێم:**

بۆ ئەوەی لەم مەسەلەیەدا بگەینە دڵنیایی تەواوەتی، ئەوا لە گۆشەی ئەم دوو نموونەیەی خوارەوە سەیری ئەم ڕاستی‌یە قووڵ و یەکجار بەرزە بکە:

*نموونەی یەکەم:*

باخ و بێستانێکی مەزن کە بەروبوومی پێگەیشتوو و گوڵزاری جوان و ڕەنگینی لەژمارەبەدەری تێدا بوو، چەند کرێکار و کارمەندێکی زۆری تێدا خرابوونە کار تاکو کارەکانی ئەو باخ و بێستانە ڕابپەڕێنن. بەڵام ئەو کرێکارەی کە ئەرکی کردنەوەی ئاوی خواردنەوە و ئاودێریی باخەکەی لە ئەستۆ نرابوو، لە ئەرکی سەرشانی خۆیدا تەمبەڵی گرتی و ئاوی باخەکەی نەدا. واتە بوو بەهۆی وشك بوونی هەموو درەخت و گوڵزارەکان!

بێ گومان لەم کاتەدا سەرجەمی کرێکارانی ناو بێستانەکە مافی سکاڵایان دەبێت لەو کرێکارەی کە لە ئەرکی سەرشانی خۆی دواکەوت. جگە لە سکاڵای ئەو بەدیهاتووانەی کە پەروەردگاری مەزن و بەدیهێنەری بەخشندە لەو باخەدا بەدیی‌هێناون و لە بەرچاوی شهوودی مەزنی خۆی‌دان، تەنانەت (ڕووناکی و گڵ و هەوا)ی ئەو باخەش مافی سکاڵایان لەو کرێکارە تەمبەڵە هەیە، چونکە بوو بەهۆی پووچ بوونەوەی کار و خزمەتگوزاری‌یەکانیان، هیچ نەبێ تێکدانی ڕەنج و کۆششیان.

*نموونەی دووهەم:*

گەر کرێکارێکی ئاسایی ناو کەشتی‌یەکی مەزنی پادشا وازی لە کارە بچووکەکەی ئەستۆی خۆی هێنا، ئەوا ئەم وازهێنانەی زیان بە ئەنجامی کار و کۆششی سەرجەم کرێکارانی کەشتی‌یەکە دەگەیەنێت و ڕەنجیان بە فیڕۆ دەدات. لەبەر ئەوە، پادشای مەزنی خاوەنی کەشتی، بە ناوی هەموو کرێکارانی ئەو کەشتی‌یەوە، هەڕەشەی توند لەو کرێکارە کەمتەرخەمە دەکات، لە کاتێکدا کە ئەو کرێکارە ناتوانێت بڵێت: من چیم تاکو ئەم هەڕەشە سامناکەم لێ بکرێت، خۆ من تەنها کارێکی جوزئی و بێ‌نرخم فەرامۆش کردووە!

چونکە لەبەر ئەوەی "بوون"ی هەر شتێك بەندە بە بوونی گشت هۆکار و هەل و مەرجەکانی، بەڵام "نەبوون"ی ئەو شتە و نەمانی – لە ڕووی ئەنجامەکەیەوە – بە نەمانی تەنها یەك دانە مەرج و نەهاتنەدیی یەك بەشی، پەیدا دەبێت، ئەوا "نەبوون" واتە: وازهێنان لە کارێك، چەندەها جۆری نەبڕاوەی "نەبوون"ی لێ دەبێتەوە. بەڵام "بوون" بەپێی جۆری خۆی، چەندین بەرهەمی زۆر و زەبەندە دەبەخشێت.

لەم ڕوانگەیەوە وتەی: "کاولکاری لە بنیاتنان ئاسانترە" لای خەڵکی وەك یاسایەکی ناسراوی لێ هاتووە.

جا لەبەر ئەوەی بناغەکانی: (کوفر و گومڕایی و لەڕێ دەرچوون و تاوان) بریتین لە: (ئینکاری و وەرنەگرتن و وازهێنان لە کار و قبوول نەکردن) ئەوا هەرچەند شێوەی ڕواڵەتی‌یان بە "ئیجابی" و خاوەن "بوون" دەربکەوێت، لە ڕاستی و ناوەڕۆکدا هەر "نەمان" و "نەبوون"ە. لەبەر ئەوە، تاوانی کوفر و گومڕایی سارییە و هەر بە خۆیەوە ناوەستێ بەڵکو دەتەنێتەوە.

ئەم تاوانانە هەروەك زیان بە ئەنجامی کار و کۆششی سەرجەم بوونەوەران دەگەیەنن، لە هەمان کاتدا پەردەش لە بەردەم درەوشانەوە "جەمالی"یەکانی ناوە جوانەکاندا دەگێڕن و دایاندەپۆشن.

بەم جۆرە، دەرکەوت کە بوونەوەران مافی سکاڵای بێ سنووریان لە کافر و گومڕایان هەیە و، پادشا مەزنەکەشیان – بە ناوی ئەوانەوە – زۆر بە توند و تیژی هەڕەشە لەم مرۆڤە بێ‌گوێ و تاوانبارە دەکات. ئەمەش عەینی حیکمەتە، چونکە بێ هیچ گومانێك ئەو تاوانبارە شایانی ئەو هەڕەشە سامناکەیە، هەروەك شایستەی جۆرەها هەڕەشەی ترسێنەرە.

# کۆتایی

بسم الله الرّحـــمن الرّحیم

﴿وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاّ مَتَاعُ الغُرُورِ﴾ (آل عمران:١٨٥)

(دەرسێك بۆ پەند وەرگرتن و زللەیەكی توند لە سەروگوێلاكی "بێئاگایی")

نەفسەكەم! ئەی سەرگەردانی نوقمبووی ناو بێئاگایی!

ئەی ئەو دەروونەی كە ژیانی دنیات گەلێ پێ خۆشە و لەو پێناوەدا خولیای دەستخستنی ئەم دنیایەت كەوتووەتە سەر و دوارۆژت لە یاد كردووە!

ئایا دەزانیت تۆ لەم هەوڵەتدا لە چی دەچیت؟ تۆ وەك وشترمل (النعامة) وایت كە ڕاوچی دەبینێت و ناشتوانێ بفڕێت دەچێ سەری خۆی لەناو لمی زەویدا دەشارێتەوە و جەستە گەورە و زەبەلاحەكەشی لە دەرەوەدا دەهێڵێتەوە و پێی وایە ئیتر ڕاوچی نایبینێت، كەچی لە ڕاستیدا ڕاوچی زۆر باش دەیبینێت و هەر تەنها خۆیەتی كە چاوەكانی لە ژێر لمدا نووقاندووە و هیچ شتێك نابینێت!

ئەی نەفسەكەم!

سەیری ئەم نموونەیە بكە و سەرنجی لێ بدە و بزانە كە چۆن تەنها بایەخدان بە ژیانی دنیا، لەزەتی شیرینی ژیان لە مرۆڤ دەكات بە ئازارێكی سەختی تاڵ!

وا دابنێ دوو پیاو لەم گوندی "بارلا"یەدا هەبن، یەكەمیان لەسەدا نەوەد و نۆی خۆشەویستانی كۆچیان بۆ ئەستەمبووڵ كردبێت و لەوێ لە گوزەرانێكی خۆش و جواندا بژین و، تەنها یەك كەس لەو خۆشەویستانەی لێرەدا مابێتەوە ئەویش سەرگەرمی كۆچ كردن بێت بۆ لای ئەوان. ئاشكرایە ئەم پیاوە گەلێ تاسەمەندی دیداری ئەستەمبووڵە و پڕ بە دڵ ئارەزوومەندی بەیەك شادبوونەوەی بەردەوامە لەگەڵ ئەو خۆشەویستانەی ئەوێدا. خۆ ئەگەر هەر كاتێك كە پێی بوترێت: "خێرا كە بەرەو ئەوێ بڕۆ" ئەوا بە دڵێكی شاد و لێوی خەندانەوە بەرەو ئەستەمبووڵ بەڕێ دەكەوێت.

بەڵام پیاوی دووهەم، لە سەدا نەوەدونۆی خۆشەویستانی کۆچیان کردووە و، لای وایە هەندێکیان لەناوچوون و هەندێکی تریشیان لە چەند جێیەکی نەبینراودا گیرساونەتەوە و، بەگوێرەی ئەم گومانەی پێی وایە کە سەرجەمی ئەو خۆشەویستە کۆچکردوانەی پەرتەوازە بوون و نەماون. ئەم مرۆڤە هەژارە گیرۆدەی دەردێکی یەکجار سەختە و بە دوای هاودەم و دڵنەواییدا دەگەڕێت تەنانەت لای ئەو تاقە گەشتیارە کۆچەرییەی کە هێشتا بەڕێ نەکەوتووە، لە بریی ئەو خۆشەویستە زۆرە کۆچ کردوانە و، دەیەوێت بە مانەوەی ئەم یەك دانە کەسەی ئێرە ئازاری جودایی ئەوان ساڕێژ بکات!

ئەی نەفسەکەم:

هەموو خۆشەویستانت، لە پێشەنگ و سەرووی هەموویانەوە پێغەمبەری خۆشەویستی خوا ﷺ کۆچیان بۆ لێواری ئەوبەری گۆڕ کردووە و یەك دوانێك نەبێت کەسیان لێرەدا نەماون، کە ئەوانیش خۆیان بۆ ئەو کۆچە پێچاوەتەوە..

کەواتە لە سامی مردن و ترسی گۆڕ، ڕووی خۆت وەرمەچەرخێنە و، جوامێرانە چاو ببڕە گۆڕەکەت و بزانە داوای چیت لێ دەکات و، مەردانە لە ڕووی مردندا پێبکەنە و بزانە داخوازی چییە.. نەکەی وەك مرۆڤی دووهەم "بێئاگایی" سەرت تێ بکات و خۆت بخلافێنیت!

ئەی نەفسەکەم:

هەرگیز نەڵێیت چەرخی ڕۆژگار گۆڕراوە و خەڵکی نوقمی دنیا و شەیدای ژیان بوون و مەستی خەم و پەژارەی ژیانن.. نەخێر وا نەڵێیت، چونکە "مردن" گۆڕانی بە سەردا نایەت و، "جودایی" نابێت بەهۆی "مانەوە" و، "کوڵەواری" و "هەژاری"ی مرۆڤیش ئاڵوگۆڕیان تێدا نابێت و تەنانەت لە زیادبووندان و، کۆچی گرۆی ئادەمیزادیش لەم دنیایە هیچ کات ڕاناوەستێت و بە خێرایی هەر بەردەوامە.

پاشان نەشڵێیت: (منیش وەکو ئەو هەموو خەڵکانە).. نەخێر وا نەڵێیت، چونکە هیچ کام لەو خەڵکە تا دەرگای گۆڕ بەولاوە لەگەڵت نایەن و هاودەمت نابن. خۆ گەر پێت وابێت "هاوبەشی کردن"ی خەڵکی لەو گیروگرفتانەدا ئەرکت سووك دەکەن و دڵدانەوەت پێ دەبەخشن، ئەوا ئەم بۆچوونە لە لێواری ئەوبەری گۆڕدا هیچ دادێکی تۆ نادات و دارای هیچ بناغەیەك نابێت و چ سوودێکت پێ ناگەیەنێت.

هەروەها لەو گومانەشدا نەبیت کە پێت وابێت جڵەوت بۆ بەرەڵا کرابێت، چونکە ئەگەر بە چاوی دانایی و سەرنجەوە سەیری ئەم میوانخانەیەی دنیا بکەیت، هیچ شتێکی بێ

ڕێسا و بێ ئامانجی تێدا نابینیت، ئیتر چۆن پێت وایە تەنها تۆ بێ ڕێسا و بێ ئامانج بیت! تەنانەت ڕووداوە گەردوونییەکان و بەسەرهاتە مەزنەکانی وەك بوومەلەرزەکانیش هەرگیزاو هەرگیز گاڵتە و یاریی دەستی ڕێکەوت نین.

بۆ نموونە: لەو کاتەدا کە دەبینیت زەوی چەندین بەرگ و پۆشاکی ڕەنگاوڕەنگی تێکەڵ و پێکەڵی لە ڕووەك و زیندەوەران، بەوپەڕی ڕێسا و جوانی و نەخشونیگار، پۆشیوە و.. هەر لە تەوقی سەرەوە تا پەنجەی پێ، دانستی تێدا دانراوە و بە ئامانجی جۆراوجۆر ئارایشت دراوە و.. وەك جەزبەی خۆشەویستی و شەوقی موریدی تەریقەتی مەولەوی[1] بە وردی و ڕێسای کامڵ و لە نێوان چەندەها ئامانجی بەرزدا سووڕ دەخوات و دەخولێتەوە.. ئا لەم کاتەدا کە بەچاوی خۆت بارودۆخی زەوی بە ڕێسا و جوانی و دانایی و وردەکاری و ئامانجی ئاوا بەرزەوە دەبینیت، ئیتر چۆن پێت وایە ئەو بوومەلەرزەیەی کە وەك شان هەڵتەکاندنی گۆی زەوی[2] وایە بۆ دەربڕینی نارەزایی لەو قورسی و دڵتەنگییە مەعنەوییەی کە بەرامبەر ڕەفتاری مرۆڤ بە تایبەت ئیمانداران هەستی پێ دەکات..

چۆن دەکرێ ئەو ڕووداوە پڕ لە مردنە بێ مەبەست و ئامانج ڕوو بدات، وەك مولحیدێك بڵاوی کردووەتەوە و پێی وابووە ئەنجامی ڕێکەوتە و، بەم گومانەشی خۆی گرفتاری هەڵەیەکی گەورە و ستەمێکی یەکجار ناشیرین کردووە، چونکە ئەو گشت گیان و سامانانەی کە گرفتاربووانی ئەو بوومەلەرزەیە لە دەستیان دا، ئەو بە بێ ئامانج و لەدەستچووی لە قەڵەم دان. کەچی لە ڕاستیدا ئەو سامانانەی کە ئیمانداران لەم جۆرە ڕووداوانەدا لە دەستیان دەدەن، بۆیان پاشەکەوت دەکرێت و بە فەرمانی خواوەندی دانای میهرەبان بە سەدەقە بۆیان دەنووسرێت و دەبێت بە کەفارەتی ئەو گوناهانەی کە ئەنجامی ناشکوریی نیعمەت بوون.

ڕۆژێك دێت کە ئەم گۆی زەوییە گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارەی خواوەند دەبینێت ڕووە جوانەکەی بەهۆی شیرك و کوفر و ناشکوریی مرۆڤەوە ناشیرین و چەپەڵ بووە. ئیتر بە فەرمانی بەدیهێنەر ڕووی خۆی بە بوومەلەرزەیەکی مەزن دەسڕێت و، بە فەرمانی خوا ئەهلی شیرك لە دۆزەخدا ڕۆ دەکات و خولکی ئەهلی شوکریش دەکات و دەڵێت: "فەرموون بۆ بەهەشت"!

---

(١) موریدی تەریقەتی مەولەوی (کە تەریقەتەکەی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمییە) لە کاتی حاڵ و جەزبەلێهاتندا، بە دەوری ئەڵقەی زیکرەکەدا دەسووڕێت و لە هەمان کاتدا بە دەوری خۆیشیدا دەخولێتەوە. (وەرگێڕ)
(٢) ئەم باسە بە بۆنەی ئەو بوومەلەرزەیەوە نووسرا کە بەسەر ئیزمیردا هات. (دانەر)

## پاشکۆی
## وتەی چواردەهەم

بسم اللّه الرّحـــمن الرّحيم

﴿إذا زُلْزِلَتِ الأَرْضُ زِلزالَهَا ۞ وأَخرَجَتِ الأَرْضُ أَثْقَالَها ۞ وَقالَ الإِنْسَانُ مَا لَهَا ۞ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخبَارَهَا ۞ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا ۞ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتاتاً لِيُرَوْا أَعْمَالَهُم ۞ فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ ۞ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ (الزلزلة)

ئەم سوورەتە مەزنە، بە چەشنێکی گومانبڕ، ڕوونی دەکاتەوە کە گۆی زەوی لە جموجووڵ و بوومەلەرزە و تەنانەت لەرینەوە ناوبەناوەکانیشیدا، لە ژێر وەحی و فەرمانی خوای گەورەدایە.

بە یارمەتیی ئاگادارکردنەوەیەکی مەعنەوی، چەند وەڵامێك هاتنە دڵمەوە بۆ هەندێ لەو پرسیارانەی کە لەبارەی بوومەلەرزە تازەکییەکەی ئێستاوە دەکرێن. چەند جارێك ویستم بە درێژی وەڵامی ئەو پرسیارانە بنووسم، بەڵام مۆڵەت نەدرام.. بۆیە وا ئێستا لێرەدا بە کورتی و پوختی دەنووسرێن.

❑ **پرسیاری یەکەم:**

ئەم بوومەلەرزە گەورەیە موسیبەتێکی مەعنەویی گەلێ دژوارتری لە موسیبەتە ماددییە دڵتەزێنەکەی دەرخواردی خەڵکی دا، کە بریتییە لەو سام و ترس و نائومێدییەی باڵیان بەسەر دەروونی ئەو خەڵکەدا کێشا. چونکە ئەم ترس و بیمە هێندە بەردەوام بوو کە لە شەویشدا حەوانەوەی لە زۆربەی خەڵکی سەندەوە و پشێوی و ئاڵۆزی زۆربەی ناوچەکانی وڵاتی گرتەوە.. ئایا سەرچاوە و هۆی ئەم ئازارە سەختە چییە؟

بە یارمەتیدانی ئاگادارکردنەوەیەکی مەعنەوی، ئەم وەڵامەی خوارەوەم بۆ هات:

ئەو بەرەڵایی و بەدڕەوشتییەی کە بە ئاشکرا و لە ڕۆژی ڕۆشنا و لە مانگێکی پیرۆزی وەك ڕەمەزاندا و، لە دەمی نوێژی تەراویحدا ڕوو دەدەن و، پڕکردنی گوێی خەڵکی بەو گۆرانییە هەست بزوێنانەی کە بە دەنگی ئافرەت دەوترێن – لە ڕێی ڕادیۆ و غەیری ڕادیۆ –

لە هەموو شوێنێکی ئەم وڵاتەی کە مەڵبەندێکی خاوێنی ئیسلام بوو.. هەموو ئەمانە، چەشتنی ئەم ئازاری ترس و بیمەیان بەرهەم هێنا.

❑ **پرسیاری دووهەم:**

بۆچی ئەم ئەشکەنجە پەروەردگاری و تەمێ کردنە خواییە تووشی وڵاتی کوفر و ئیلحاد نابێت و، موسڵمانە لاواز و هەژارەکانی پێوە گیرۆدە دەبن؟

**وەڵام:** هەروەك تاوانە مەزنەکان بۆ دادگا گەورەکانی جەزا ڕەوانە دەکرێن و دواخستنی سزاکانیان بەو دادگایانە دەسپێررێت، کەچی هەر لە مەڵبەندی قەزا و ناحیەکاندا تاوانە بچووکەکان یەکلایی دەکرێنەوە و سزاکانیان دەستنیشان دەکرێن.. بە هەمان جۆر، بەشی هەرە زۆری تۆڵەی تاوانی موڵحید و کافران بۆ دادگای گەورەی حەشری مەزن دوا دەخرێن، بەڵام هەر لەم دنیایەدا و لەسەر داخوازیی دانستێکی پەروەردگاریی گرنگ، ئیمانداران لەسەر هەندێ هەڵە و گوناهی خۆیان سزا دەدرێن[1].

❑ **پرسیاری سێهەم:**

بۆچی ئەم موسیبەتە سەرجەمی وڵات دەگرێتەوە، مادەم ئەنجامی چەند هەڵە و گوناهێکە هەندێ کەس دەیانکەن؟

**وەڵام:** زۆربەی خەڵکی لەگەڵ ئەو چەند ستەمکارە کەمانەدا بەشدارن. چونکە یان بە "کردەوە" یان بە "شوێنکەوتن" یان بە "گوێڕایەڵیی فەرمانەکانیان" لە ناوەڕۆکدا لەگەڵیاندان و، ئەمەش کارێك دەکات موسیبەتەکە ئەو شێوە گشتییە بگرێتە خۆ. چونکە موسیبەت بەهۆی بێ گوێیی و ملنەدان و گوناهی زۆربەی خەڵکەوە دەتەنێتەوە و گشت لایەك دەگرێتەوە.

❑ **پرسیاری چوارەم:**

مادەم ئەم بوومەلەرزەیە بەهۆی تاوان و خراپکارییەکان و بۆ مەبەستی کەفارەتی گوناهەکان ڕووی داوە، ئەدی بۆچی بێ تاوانەکانیش دەگرێتەوە و بە بڵێسەکەی دەسووتێن، لە کاتێکدا کە ئەوان توخنی هیچ هەڵە و گوناهێك نەکەوتوون تاکو کەفارەتەکەی بدەن. ئایا دادگەریی پەروەردگار چۆن بەمە ڕازی دەبێت؟

هەروەها بە یارمەتیی ئاگادارییەکی مەعنەوی ئەم وەڵامەم بۆ هات:

---

(١) بە هەمان جۆر، گەر ڕووسەکان و هاوچەشنیان واز لە ئایینێکی دەستکاری کراوی سڕاوە و هەڵوەشاو بهێنن و گاڵتەی پێ بکەن، غیرەتی خوای پێناجوولێت وەك ئەوەی کە گاڵتەکردن بە ئایینێکی ڕاست و هەتاهەتایی و نەگۆڕاو بۆ هەڵوەشان و سڕینەوە، غیرەتی خوا دەبزوێنێت. بۆیە گۆی زەوی ئەوان مۆڵەت دەدات و ڕقیشی لەمان دەبێتەوە. (دانەر)

ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی بە نهێنیی "قەدەری خوا"وە هەیە، بۆیە حەوالەی "پەیامی قەدەر"ی دەکەین و لێرەدا ئەم ئەندازەیەی خوارەوە دەخەینە ڕوو:

نهێنیی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ:

﴿وَاتَّقُوا فِتْنَةً لا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً﴾ (الأنفال:٢٥).

واتە: خۆتان لە بەڵا و گیروگرفتێك بپارێزن کە نەك تەنها ستەمکاران دەگرێتەوە، بەڵکو بێتاوانەکانیشی پێوە گیرۆدە دەبن. نهێنیی ئەم ئایەتە بریتی‌یە لەوەی کە:

ئەم دنیایە خانەی تاقیکردنەوە و موجاهەدە و تەکلیفە، خۆ تاقیکردنەوە و تەکلیفیش داخوازی ئەوەن کە ڕاستی‌یەکان شارراوە و پەنهان بن، تاکو پێشبڕکێ دروست ببێت و لە ڕێی موجاهەدەوە ڕاست و ڕاستگۆیان لەگەڵ ئەبووبەکری صیددیقدا بۆ "أعلى عليين" بەرز ببنەوە و، درۆزنانیش لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزندا بەرەو "أسفل سافلين" بەربنەوە.

خۆ ئەگەر کەسانی بێتاوان لەو موسیبەتانەدا دەرباز ببن و هیچ پریشك و ئازارێکیان بەر نەکەوێت ئەوا "ئیمان" دەبوو بە شتێکی ئاشکرا و سەلماو لای هەموان و، کافران و ئیمانداران وەك یەك و بێ جیاوازی ملیان بۆ کەچ دەکرد و ئەو کاتەش تەکلیف لە گۆڕێدا نەدەما و پێویستیش بۆ مرۆڤ نەدەمایەوە کە بە پلەوپایەکانی ئیماندا سەربکەوێت و بەرز ببێتەوە.

★ مادەم بەپێی دانایی خواوەند و بە بێ جیاوازی موسیبەت تووشی ستەمکار و ستەم لێکراو دەبێت، ئایا بەشی ئەو ستەم لێکراوانە لە دادگەریی خواوەند و میهرەبانی‌یە فراوانەکەی‌دا کامەیە؟

**وەڵام**: لە ناوەندی ئەو غەزەب و بەڵایەدا درەوشانەوەیەکی میهرەبانی هەیە، چونکە سامانی لەناوچووی ئەو بێتاوانانە بە هەمیشەیی لە دواڕۆژدا دەمێنێتەوە و وەك صەدەقە بۆیان پاشەکەوت دەکرێت. ژیانە لەناوچووەکەشیان لەبەر ئەوەی جۆرە شەهیدبوونێکی بەخۆیەوە دیوە، بۆیان دەگۆڕرێت بە ژیانێکی هەمیشەیی. واتە ئەو موسیبەت و بەڵایە سەبارەت بەو بێتاوانانەوە جۆرێکی میهرەبانیی خواوەندە لە دووتوێی ئەو ئازارە سەخت و کاتی‌یەدا، چونکە بە ئازار و سەختی‌یەکی کاتی و تا ڕادەیەك کەم، دەستکەوتێکی گەورە و بەردەوامیان پێ دەبەخشرێت.

❑ **پرسیاری پێنجەم:**

خوای گەورەی دادگەر و میهرەبان و بەتوانا و دانا، تۆڵەی تاوانە تایبەتی‌یەکان بە چەند سزایەکی تایبەتی ناسێنێتەوە، بەڵکو ماك(عنصر)ێکی گەورە و زەبەلاحی وەك گۆی زەوی بۆ

تـەمێ کردن و سـزادان و تۆڵەسـەندنەوە زاڵ دەکـات.. ئایـا ئــەم کــارە لەگــەڵ هەمەلایــەنیی توانست و جوانیی میهرەبانیی خوادا دەگونجێ؟

**وەڵام:** خوای بەتوانای مەزن چەندین ئەرك و فرمـانی زۆری خسـتووەتە ئەستۆی هـەموو یەکێك لە توخمـەکان و، چـەندەها ئـەنجامی زۆر و زەبـەندەش لـەو کـار و فرمانانـەی ئەوانـەوە بەرهەم دەهێنێت.

جا ئەگەر تەنها ئـەنجامی یـەکێك لـە کـار و فرمانـە زۆرەکـانی یـەك دانـە لـەو توخـمانە بـە ناشیرین (واتە بە شەڕ و موسیبەت و بەڵا) دەربکـەوێت، ئـەوا سـەرجەمی ئەنجامـەکانی کـار و ئەرکەکانی تری ئەو ماکە، ئەم ئەنجامە ناهەموارە وەك ئەنجامێکی جـوان لـێدەکـەن. چـونکە ئەگـەر ڕێ لـەو توخـمە بگیرایـە کـە لـە مرۆڤ تووڕەبووە و نەهێڵرایـە کــار و فرمانەکـەی سەرشانی، ئەو تەنها ئەنجامە ناشیرینە بەرهەم بهێنێت، ئـەوا گەلـێ خێر و کـرداری باشـی بـە ئەندازەی ژمارەی ئەنجامە باشەکانی سـەرجەم ئەرکـەکانی تـری ئـەو ماکـە فـەرامۆش دەکـرا. واتە بە ئەندازەی ئەو ئەنجامە باشانە شەڕ و خراپەی زۆر ڕوویـان دەدا. چونکـە وەك ئاشـکرایە ئەنجام نەدانی خێرێکی پێویست بە شەڕ دادەنرێت.

جا ئایا دەکرێ ئەم هەموو شـەڕ و خراپانـە ڕوو بـدەن تەنـها لەبـەر ڕوونـەدانی یـەك شـەڕی تەنیا؟!

دیارە ئەمە پێچەوانەی دانستە و ناشیرینییەکی ئاشـکرایە و دوورکەوتنەوەیـە لـە ڕاستی و ناتەواوییەکی عەیبدارە. خۆ دانسـت و توانا و ڕاستی، خاوێن و دوورن لـە هـەموو نـەنگی و ناتەواوییەك.

جا لەبەر ئـەوەی هـەندێك لـە خراپکارییـەکانی مرۆڤ "تـاوانی گشتی"ن و بـە ئاشـکرا سنووری مافی گەلـێ بوونەوەران دەشکێنن و گاڵتەیان پێ دەکەن، ئەوا ڕق و قینـی سـەرجەم توخـمەکان بە تایبەت "زەوی"ی پێ دەورووژێت. کەواتە، بێ هیچ گومـانێك، فـەرماندان بـە ماکێکی مەزنی وەك زەوی کە ئەو تاوانبارانە تەمێ بکات بۆ دەرخستنی مەزنیی تاوانەکەیان، عەینی حیکمەت و دادگەرییە و، لە هەمان کاتدا بۆ ستەم لێکراوانیش عەینی میهرەبانییە!

❑ **پرسیاری شەشەم:**

بێئاگایان لەناو خەڵکیدا ئەوە بڵاو دەکەنەوە کە ڕوودانـی "بوومەلـەرزە" تەنـها ئـەنجامی ئاڵوگۆڕ و پشێویی کانزاکانی ناوجەرگەی زەوییە و، وەك ڕووداوێکـی بـێ مەبەسـت و، بـە ئەنجامی "ڕێکەوت" و کاری "سروشت"ی دادەنێن و، هۆکار و ئەنجامە مەعنەوییـەکانی ئـەم

ڕووداوه‌ نابينن تاكو له‌و بێ‌ئاگايی‌يه‌ی تيايدان، بێدار ببنه‌وه‌. ئايا هيچ ڕاستی‌يه‌ك هه‌يه‌ پاڵپشتی بۆچوونه‌كه‌يان بێت؟

**وه‌ڵام:** جگه‌ له‌ گومڕايی هيچيان به‌ ده‌سته‌وه‌ نی‌يه‌ و بۆچوونه‌كه‌يان دارای هيچ ڕاستی‌يه‌ك نی‌يه‌. چونكه‌ به‌ چاوی خۆمان ده‌بينين كه‌ هه‌موو يه‌كێك له‌و هه‌زاران جۆرانه‌ی زينده‌وه‌ران كه‌ له‌سه‌ر گۆی زه‌وی‌دا له‌ په‌نجا مليۆن زياتر ده‌بن، هه‌موو ساڵێك كراس و پۆشاكه‌ ڕه‌نگين و ڕێكوپێكه‌كانيان له‌به‌ر ده‌كه‌ن و ده‌يانگۆڕن، ته‌نانه‌ت ته‌نها يه‌ك دانه‌ باڵيش كه‌ ئه‌ندامێكی نێوان سه‌دان ئه‌ندامی "مێش"ی له‌ژماره‌به‌ده‌ره‌، فه‌رامۆش ناكرێت و ڕووناكيی "قه‌صد" و ويست و دانستی پێوه‌ دياره‌. ئه‌مه‌ش به‌ڵگه‌يه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ كار و بارودۆخه‌ مه‌زنه‌كانی گۆی زه‌به‌لاحی زه‌وی - كه‌ لانك و ژيار و لانه‌ی خاوه‌ن هه‌ستانی له‌ژماره‌به‌ده‌ره‌ - له‌ بازنه‌ی ويست و ئيختيار و قه‌صدی خوای گه‌وره‌ ده‌رناچێت، به‌ڵكو هيچ شتێكی جوزئی يان كوللی له‌و بازنه‌يه‌ به‌ده‌ر نی‌يه‌.

به‌ڵام خواوه‌ندی خاوه‌ن توانستی ڕه‌ها به‌پێی خواستی دانسته‌ ڕه‌هاكه‌ی خۆی، هۆكاره‌ ڕواڵه‌تی‌يه‌كانی كردووه‌ به‌ په‌رده‌ی ڕووكه‌ش له‌ به‌رده‌م كار و هه‌ڵسوكه‌وته‌كانی‌دا و، هه‌ر كات ويستی له‌سه‌ر ڕوودانی بوومه‌له‌رزه‌ بێت ئه‌وا هه‌ندێ جار فه‌رمان به‌ يه‌كێك له‌ كانزاكان ده‌دات كه‌ بجووڵێت و به‌م پێ‌يه‌ دايده‌گيرسێنێت.

وا دابنێ "بوومه‌له‌رزه‌" به‌ ڕوودانی ئاڵوگۆڕ و پشێويی كانزاكان په‌يدا ببێت، خۆ هێشتا له‌م كاته‌شدا هه‌رگيز به‌ بێ فه‌رمانی خوای گه‌وره‌ و بێ ئه‌وه‌ش له‌گه‌ڵ دانستی ئه‌ودا بگونجێت، ڕوو نادات. چونكه‌ ئه‌گه‌ر ئۆباڵی تاوانی "كوشتن" نه‌خرێته‌ ئه‌ستۆی قاتڵ و ته‌نها به‌ كاری ئه‌و بارووته‌ بزانرێت كه‌ له‌ فيشه‌كی تفه‌نگه‌كه‌ی‌دا گڕی گرتووه‌، به‌ شێتی و گه‌مژه‌يی و فه‌وتانی ته‌واوه‌تيی مافی كوژراوه‌كه‌ داده‌نرێت.. به‌ هه‌مان جۆر به‌ڵكو له‌وه‌ش شێتی و نه‌فامی‌تر ئه‌وه‌يه‌ كه‌ له‌م چه‌شنه‌ ڕووداوانه‌دا سه‌يری سروشت بكرێت و ئه‌و فه‌رمانه‌ی دانست و ويستی خوا فه‌رامۆش بكرێت كه‌ بۆ داگيرساندنی بۆمبای ناوجه‌رگی زه‌وی ده‌ری كردووه‌، ئه‌و زه‌وی‌يه‌ی كه‌ فه‌رمانبه‌ردار و گوێڕايه‌ڵ و كه‌شتی و فڕۆكه‌ی خواوه‌ندی به‌توانای مه‌زنه‌ و، خوای گه‌وره‌ فه‌رمان بۆ ئه‌و بۆمبايه‌ ده‌رده‌كات بته‌قێته‌وه‌ و بێ‌ئاگايان به‌ خه‌به‌ر بهێنێت و سته‌مكارانيش ڕابچڵه‌كێنێت.

**(پاشماوه‌ و په‌راوێزی پرسياری شه‌شه‌م)**

گومڕايان و ئه‌هلی ئيلحاد له‌ پێناوی پارێزگاريی ڕێبازی ڕێگريان له‌ "بێداريی ئيمانی"، ده‌چن سه‌رسه‌ختی و نه‌فامی‌يه‌كی هێنده‌ نامۆ و سه‌ير ده‌رده‌خه‌ن كه‌ مرۆڤ وا لێ ده‌كات له‌ مرۆڤايه‌تيی خۆی په‌شيمان ببێته‌وه‌! بۆ نموونه‌:

ئەو سەرپێچییە تاریك و نووتەك و ستەمكارانەیەی كە گرۆی مرۆڤ لەم دەمانەی دواییدا بەرامبەر فەرمانەكانی خواوەند نواندی و هەموو جیهانی گرتەوە بە رادەیەك ماكە گشتییەكانی هەژاند و هەموویانی تووڕە كرد.. بگرە لە ئەنجامی ئەوانەوە پەروەردگاریتیی بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەویش بە سیفەتی "رب العالمين" و فەرمانڕەوای هەموو گەردوون - نەك بە سیفەتی پەروەردگاریتییەكی هەندەكیی تایبەت - لە سەرانسەری جیهاندا و لە بازنەیەكی هەمەكی و فراواندا دەركەوت و.. بە بەڵا و گیروگرفتی گشتیی ساماناكی وەك: جەنگی جیهانی و بوومەلەرزە و لافاوە ڕامالەرەكان و ڕەشەبا توند و تیژ و هەورە برووسكە سوتێنەر و تۆفان و زریانە ڕووخێنەرەكان، زللەی لە گرۆی ئادەمیزاد وەشاند، تاكو ئەم مرۆڤە نوقم بووەی ناو بێئاگایی بێدار ببێتەوە و هانی بدات واز لە ستەم و سنوور شكاندن و لەخۆبایی‌بوونە ترسناكەكانی بهێنێت و، پەروەردگارە مەزنەكەی خۆی پێ بناسێنێت كە پشتی لێ هەڵكردووە. بەمەش خوای گەورە بە ئاشكرا و ڕوونی دانست و توانست و دادگەری و قەییومییەت و ویست و فەرمانڕەوایەتیی خۆی ئاشكرا كرد..

كەچی سەرباری ئەمە، چەند شەیتانێكی نەفام كە لە شێوە و ڕووخساری مرۆڤدان، سەرسەختییەكی گەلحۆیانە و ئابڕووبەر لە ڕووی ئەو ئاماژە پەروەردگارییە هەمەكی و پەروەردە خواییە گشتییانە بۆ مرۆڤایەتی، دەنوێنن و، دەڵێن: (ئەوانە چەند هۆكارێكی سروشتین.. تەقینەوە و تێكەڵ بوونی كانزاكانن.. تەنها بە ڕێكەوت ڕوو دەدەن.. گەرمای خۆر و كارەبا بەر یەك كەوتن و بۆ ماوەی پێنج كاتژمێر لە ئەمریكادا مەكینەكانی لەكارخست.. ئاسمانی شاری قەستەمۆنی سوور هەڵگەڕا و دەڵێی ئاگری تێ بەربووە)! ئەمانە و هاوچەشنیان لەم وڕێنە بێ واتا و ناوەڕۆكانە.

"نەزانی"ی ساماناكی ئەنجامی گومڕایی و، "سەرسەختی"ی بێز لێكراوی بەرهەمی ئیلحاد و كافری، نایەڵێت پەی بە ماهییەتی هۆكارەكان ببەن و بزانن كە هۆكارەكان تەنها چەند پەردەیەكن لە بەردەم "توانستی خواوەند"دا دادراونەتەوە..

ئەوەتا دەبینیت یەكێك لەوانە، لەبەر نەزانیی خۆی، چەند هۆكارێكی ڕواڵەتی زەق دەكاتەوە و بۆ نموونە دەڵێت: "ئەم تۆوە بچووكە ئەو درەختە سنەوبەرە زەبەلاحەی بەرهەم هێناوە"! دەیەوێت لەم ڕێیەوە ئینكاریی موعجیزەی بەدیهێنەرە مەزنەكەی ئەو درەختە بكات. لە كاتێكدا كە بەدیهێنانی ئەو درەختە گەر بە هۆكارەكان بسپێررێت، بە سەد كارگەش ناتوانن ئەو درەختە پێك بهێنن.

دەرخستنی هۆكارە ڕواڵەتی‌یەكانی وەك ئەم نموونەیە لە لایەن گومڕایانەوە، بۆ مەبەستی كەم كردنەوە و داگرتنە لە شان و شكۆی مەزنێتیی كاری پەروەردگارێتیی مەزن كە دانست و ئیختیاری لەسەر نەخشاوە.

یان دەبینیت یەكێكی تریان دەچێت "ناوێكی زانستی" لە ڕاستی‌یەكی گرنگی وەها دەنێت كە ژیریی مرۆڤ ناتوانێت پەی بە مەودا و قووڵی‌یەكەی ببات. پێی وایە تەنها بە "ناولێنان" ئەو ڕاستی‌یە گرنگە ناسراوە و وەك شتێكی ئاسایی لێ هاتووە و، دانست و ناوەڕۆكی تێدا نی‌یە!

سەرنج لەم گەلحۆیی و نەفامی‌یە بێ‌سنوورە بدە، چونكە وا دەزانن تەنها ناونان لەو ڕاستی‌یەی كە پێناساندن و باسی حیكمەتەكانی لە سەد لاپەڕەدا جێی نابێتەوە، دەیكات بە شتێكی ئاسایی و ناسراو! وەك دەڵێن: "ئەم شتە لەوە پەیدا بووە.. ئەم ڕووداوە هی ماددەی خۆرە كە لەگەڵ كارەبادا بەریەك كەوتوون" پێیان وایە تەنها بەم ناولێنانە ڕووداوەكەیان شی كردووەتەوە و لە خەڵكی‌یان گەیاندووە!!

هەندێكیان نەزانی‌یەكی لە هی "ئەبووجەهل" زیاتر دەردەخات، كاتێ كە ڕووداوێكی مەبەستداری تایبەتیی پەروەردگاری‌یانە بۆ یەكێك لە یاساكانی سروشت دەگێڕێتەوە، وەك بڵێی بكەری ڕووداوەكە ئەو یاسایە بێت! بە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوەش بۆ یاساكە پەیوەندیی ئەو ڕووداوە بە ویستی هەمەكیی خواوەند و ئیختیاری ڕەها و فەرمانڕەوایەتیی خواوەندەوە دەبچڕێت، كە یاسا كارگوزارەكانی لەناو گەردووندا دەیاننوێنن.. پاشان دەبینیت ئەو ڕووداوە بۆ ڕێكەوت و سروشت دەگێڕێتەوە، وەك ئەو گەلحۆ سەرسەختەی كە سەركەوتنی سەربازێك یان تیپێك لە جەنگدا بۆ "ڕێسا و یاسای سەربازی" دەگێڕێتەوە و لە فەرماندەی سوپا و دەستەڵاتی دەوڵەت و كارە نیشانەكراوەكانی دادەبڕێت!

با لەم نموونەیەوە سەیری نەفامی‌یە ئابڕووبەرەكەیان بكەین:

ئەگەر وەستایەكی كارامە سەد هۆقە خواردەمەنیی جۆراوجۆر و سەد گەز كووتاڵی جیاجیای لە پارچە تەختەیەكی بە ئەندازەی سەری نینۆكێك دروست كرد و، یەكێك وتی: (ئەم كارە دەراسایانە تەنها ئەو پارچە تەختە بێ نرخە ئەنجامی داون).. ئایا بەم وڕێنەیەی نەفامی‌یەكی سەیری دەرنەبڕیوە؟ ئەم نموونەیە كتومت وەك هەڵوێستی ئەو كەسە وایە كە تۆوێكی ڕەق و تەق بۆ بەدیهاتنی درەخت پێش‌چاو دەخات و ئینكاریی سنعەتی بەدیهێنەری

دانا دەكات، تەنانەت لە نرخ و بەهای ئەو كارە دەراسایانەی دروستبوونی درەختەكە دادەگرێت كاتێ كە دەیانداتە پاڵ ڕێكەوتی كتوكوێر و هۆكارە سروشتییەكان!

جا نەفامیی ئەوانە كتومت وەك هی ناو ئەم نموونەیە وایە!

❑ **پرسیاری حەوتەم:**

چۆن دەزانرێت ئەم ڕووداوەی گۆی زەوی بە تایبەت ئاراستەی موسڵمانەكانی ئەم وڵاتە كراوە و مەبەست ئەوانە؟ بۆچی بە زۆری لە لای "ئیزمیر" و "ئەرزنجان"ەوە ڕوو دەدات؟

**وەڵام:**

ئاماژە زۆرە كە مەبەست لەم ڕووداوە بەركەوتنی ئەهلی ئیمانە. چونكە ڕوودانی لەم زستانە سارده و لە دەمی تاریكایی شەو و سەختیی سەرمادا، بە تایبەت لەم وڵاتەی كە ڕێزی مانگی ڕەمەزان ناگرێت، هەروەها بەردەوامبوونی ئەم ڕووداوەش بە سووكی و لەسەرخۆیی، كە ئەنجامی پەند لێ وەرنەگرتنە و بۆ مەبەستی بێدار كردنەوەی بێ ئاگایانە.. ئەمانە و ئاماژەكانی تری هاوچەشنیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە مەبەست لەم ڕووداوە بەركەوتنی ئیماندارانە و بە تایبەتی ڕووی لەوانە، تاكو ڕایان بچڵەكێنێت و بۆ نوێژ و نزا و لاڵانەوە لە بەردەم خوای گەورەدا، هانیان بدات.

سەبارەت بە توندوتیژیی لەرینەوەی بوومەلەرزەكەش لە ئەرزنجانی كلۆلدا، ئەوا دوو ڕووی تێدایە:

*یەكەمیان:*

ئەوانی زوو تێوە گلاند تاكو ببێت بە كەفارەتی گوناهە بچووكەكانیان.

*دووهەم:*

دەگونجێ لە پێشدا ئەم بوومەلەرزەیە زللەی خوّی لەو شوێنانە بۆ ئەوە وەشاندبێت كە ئەهلی زەندەقە و ئیلحاد مەڵبەندێكی بەهێزیان بۆ چالاكییەكانی خۆیان لەو شوێنانە دامەزراندووە و دەرفەتیان لە كەم ژمارەیی پارێزگارە بەهێز و ڕەسەنەكانی ئیمان و ئیسلام بینیوە، یاخود بێ دەستەڵاتیی ئیماندارانیان لەوێدا قۆزتووەتەوە.

لا يعلم الغيب إلاّ الله.

﴿**سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ**﴾.

# وتەی پازدەهەم

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿ولقد زینّا السماءَ الدنیا بمصابیحَ وجعلناها رُجوماً للشیاطین﴾ (الملك:٥)

ئەی ئەو کەسەی کە لە قوتابخانە تازەکاندا چەند باس و بابەتێکی بێ گیانی بیانیی لە "زانستی گەردووناسی" خوێندووە و، لەم ڕێیەوە زەینی تەسك بووەتەوە و عەقڵیشی ڕۆشتووەتە ناو چاوەکانی، تەنانەت وای لێ هاتووە کە تێگەیشتنی تەواوەتیی: نهێنیی هەرە مەزنی ئەم ئایەتە پیرۆزەی لە تواناداا نەماوە!

بزانە کە:

پەیژەیەکی حەوت پلیکانەیی هەیە بۆ سەرکەوتن بەرەو ئاسمانی ئەم ئایەتە مەزنە. وەرە با پێکەوە سەربکەوین:

**□ پلەی یەکەم:**

"حەقیقەت" و "حیکمەت" داخوازی ئەوەن کە ئاسمانەکانیش - وەك زەوی - سەرنشینی گونجاوی خۆیانیان بێت. ئەم سەرنشینە جیاجیا و ڕەگەز جیاوازانەش لە زاراوەی شەریعەتدا ناوی: "مەلائیکەت" و "ڕۆحانیات"یان لێ نراوە.

بەڵێ "حەقیقەت"(ڕاستی) وا دەخوازێت، چونکە پڕکردنەوەی ئەم زەوییەی کە لە چاو ئاسماندا بچووك و بێ بایەخ دیارە، لە خاوەن هەست و زیندەوەران و ئاوەدان کردنەوەی بەردەوامی بە بوونەوەری هەستیار، پاش چۆڵ بوون و خاڵی کردنەوەی لەوانەی پێشووی.. ئەم کارە ئاماژە دەکات، بەڵکو بە ڕاشکاوی دان بەوەدا دەنێت کە: ئەو ئاسمانە خاوەن بورجانەی دەڵێی کۆشك و تەلاری ڕازاوەن، پڕ بن لە بەدیهاتووی خاوەن هەست و شعوور.

جا ئەو سەرنشینە خاوەن هەست و شعوورانەی ئەوێ، بە وێنەی جیننی و ئادەمیزاد، سەیرکەری کۆشکی ئەم جیهانە و، خوێنەری پەڕاوی ئەم گەردوونە و، دەڵاڵ و جارچیی مەزنایەتیی پەروەردگاریێتیی خواوەندن..

چونکە جوانکردن و ڕازاندنەوەی ئەم جیهانە بە چەندەها ئارایشت و جوانی و نەخش و نیگاری ناوازە و ڕەنگین، بە ئاشکرا داخوازی ئەوەیە کە سەرنجی بەدیهاتووانی خاوەن بیر و

ڕێزگر و نرخ‌شناس و پیزان بۆ لای ئەو جوانکاری‌یانە ڕابکێشرێت، چونکە هەروەك "خواردن" بۆ کەسانی "برسی" دادەنرێت، "جوانی"ش پێش‌چاوی "شەیدایان" دەخرێت!

خۆ کە لەم گۆشەیەوە سەیری ڕۆڵی جیننی و ئادەمیزاد دەکەین، دەبینین تەنها یەك لە ملیۆنی ئەو ئەرکە بێ‌سنوورەی "شەیدایی" نەبێت زیاتریان لە توانادا نی‌یە، چ جای ئەوەی بتوانن مافی تەواویش بە ئەرکی "سەرپەرشتیکاریی شکۆدار" و "بەندایەتیی فراوان" بدەن کە خراوەتە ئەستۆیانەوە. واتە: ئەو کارمەندی و فەرمانبەری‌یە جۆراوجۆر و نەبڕاوانە پێویستیان بە چەندین جۆری لەژمارەبەدەری مەلائیکەت و ڕۆحانیات دەبێت تا ئەنجامیان بدەن.

هەروەها بەپێی ئاماژەی هەندێ "ڕیوایەت و ئەثەر" و، بە گوێرەی داخوازیی ڕێکوپێکیی ڕێسای جیهان، دەتوانرێت بوترێت:

هەندێ لە تەن و قەبارە بزۆکەکان، هەر لە هەسارە گەڕۆکەکانەوە تا دەگاتە دڵۆپە وردەکان، تێکڕا فڕۆکە و کەشتیی جۆرێکن لە مەلائیکەتان، کە بە فەرمانی خوای گەورە سواری ئەو تەن و قەبارە کەشتی ئاسایانە دەبن و بە ناو جیهانی بینراودا گەشت و سەیرانی خۆیان دەکەن.

هەروەها دەتوانرێ بوترێت:

جەستەی بەشێك لە زیندەوەران، هەر لە باڵندەکانی بەهەشتەوە - کە فەرموودەی پیرۆز[1] بە باڵندەی سەوز وەسفی کردوون - تا دەگاتە مێش و مێشوولەی سەر ڕووی زەوی، تێکڕا فڕۆکەی جۆرێکن لە ڕۆحیانەتەکان کە بە ناوی خواوەندی "حەق"ەوە دەڕۆنە ناو جەستەی ئەو باڵندانە و لە پەنجەرەی هەستەکانی ئەوانەوە سەیری جیهانی "جیسمانیات"(واتە: جیهانی مادییەتی بینراو) دەکەن و بۆ موعجیزاتی بەدیهاتنی ناو ئەو جیهانە دەڕوانن.

جا ئەو بەدیهێنەرە بەخشندەیەی کە لە "گڵی چڕ و پڕ" و "ئاوی لیڵ" بەدیهاتووی خاوەن هەست و شعووری ڕووناك و دارای ژیانی ناسك و نیان بەدی دەهێنێت، هەر ئەو بەدیهێنەرە - بێ‌هیچ گومانێك - گەلێ بەدیهاتووی هەستیاری زۆر و زەبەندەش لە دەریای ڕووناکی و تاریکی دروست دەکات و بەدی‌یان دەهێنێت، کە دیارە ئەمانە زۆر شیاوتر و لەبارترن بۆ گیان و ژیان، تەنانەت دروستیشی کردوون و بە زۆر و زەبەندەیی بەدیی هێناون.

ئەگەر حەز دەکەیت "بوون"ی "مەلائیکەت" و "ڕۆحانیات"ت بۆ بچەسپێت، ئەوا سەر

---

(١) ئاماژەیە بۆ فەرموودەی: "أرواحهم في جوف طير خضر لـها قناديل معلقة بالعرش تسرح من الجنة حيث تشاء". رواه مسلم عن عبدالله بن مسعود. كتاب الأمارة: ١٢. (وەرگێڕ).

له‌ په‌یامی: "خالێك له‌ نووری ناسینی خوای گه‌وره‌" و "وته‌ی بیست و نۆهه‌م" بده‌، چونكه‌ له‌وێ به‌ بێ گومانی بوونی ئه‌وانمان چه‌سپاندووه‌.

❑ **پله‌ی دووهه‌م:**

به‌ وێنه‌ی په‌یوه‌ندیی نێوان دوو هه‌رێمی یه‌ك ده‌وڵه‌ت، زه‌وی و ئاسمانه‌كانیش له‌گه‌ڵ یه‌كتری‌دا په‌یوه‌ستن، ئه‌وه‌تا هه‌ندێ په‌یوه‌ندیی توندوتۆڵ و مامه‌ڵه‌ی گرنگیان له‌ نێواندا هه‌یه‌ و، هه‌ر شتێك بۆ زه‌وی گرنگ بێت، وه‌ك: ڕووناكی و گه‌رمی و به‌ره‌كه‌ت و ڕه‌حمه‌ت و هاوچه‌شنیان، هه‌موویان له‌ ئاسمانه‌وه‌ بۆ زه‌وی ده‌نێررێن.

هه‌روه‌ها به‌ "یه‌كده‌نگی"ی سه‌رجه‌م ئایینه‌ ئاسمانی‌یه‌كان، كه‌ پاڵیان به‌ "سرووش"ی خواوه‌نده‌وه‌ داوه‌ و.. به‌ "ته‌واتور"ی بینینی سه‌رجه‌م "ئه‌هلی كه‌شف"یش چه‌سپاوه‌ كه‌: مه‌لائیكه‌ت و ڕۆحانیات له‌ ئاسمانه‌وه‌ دێن بۆ زه‌وی. جا به‌ "حه‌دس"ی[1] بێ گومانی نزیك له‌ هه‌ست پێ كردنه‌وه‌ ده‌زانرێت كه‌ سه‌رنشینانی گۆی زه‌ویش ڕێگایه‌كیان هه‌یه‌ لێیه‌وه‌ بۆ ئاسمان سه‌ربكه‌ون، چونكه‌ هه‌روه‌ك له‌ هه‌موو كاتێكدا "ژیری" و "بیر" و "ڕوانین"ی هه‌موو كه‌سێك ڕوو له‌ ئاسمان ده‌كات، به‌ هه‌مان جۆر "ڕۆح"ی پێغه‌مبه‌ران و پیاوچاكانیش – كه‌ به‌هۆی دانانی كۆڵه‌ قورسه‌كانیان شانیان سووك بووه‌ – و "گیان"ی مردووانیش كه‌ پۆشاكی جه‌سته‌یان له‌به‌ر داماڵیوه‌، به‌ فه‌رمانی خوای گه‌وره‌ به‌ره‌و ئاسمان سه‌رده‌كه‌ون.

جا مادەم ئه‌و كه‌سه‌ ناسك و نیانانه‌ی كه‌ كۆڵی سه‌رشانیان سووك بووه‌، ده‌ڕۆن بۆ ئه‌وێ، ئه‌وا ئه‌و سه‌رنشینانه‌ی ناو هه‌وا و سه‌ر ڕووی زه‌ویش كه‌ جه‌سته‌یه‌كی میسالی‌یان پۆشیوه‌ و ئه‌وانه‌ش كه‌ به‌ وێنه‌ی شان‌سووكیی "گیان" ته‌نك و ناسك و نیانن، ده‌توانن بڕۆن بۆ ئاسمان.

❑ **پله‌ی سێهه‌م:**

ئارامی و بێ‌ده‌نگی و ڕێسا و به‌رده‌وامی و فراوانێتی و نوورانێتیی ئاسمان، به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ سه‌رنشینانی ئه‌وێ وه‌ك هی زه‌وی نین، به‌ڵكو سه‌رجه‌می سه‌رنشینانی ئاسمان گوێڕایه‌ڵی ئه‌و فه‌رمانانه‌ن كه‌ پێیان ده‌سپێررێت. چونكه‌ له‌وێ‌دا، له‌به‌ر فراوانیی یه‌كجار زۆری ژینگه‌ و نیشته‌جێ‌كه‌یان، هیچ هۆكارێكی ناكۆكی و پاشقول له‌ یه‌كتردان له‌ گۆڕێ‌دا نی‌یه‌ و، هه‌ر هه‌موویان له‌سه‌ر سروشتی "پاك و خاوێنی" به‌دی هێنراون و به‌ هیچ تاوان و گوناهێكه‌وه‌ گیرۆده‌ نه‌بوون و، پله‌ و پایه‌شیان نه‌گۆڕ و نه‌جووڵاوه‌. به‌ پێچه‌وانه‌ی زه‌وی كه‌ شتانی دژ به‌ یه‌كی تێدا كۆبووه‌ته‌وه‌ و خراپكارانیشی تێدا ئاوێته‌ی چاكه‌كاران بووه‌ و، به‌م

---

(١) "حه‌دس" بریتی‌یه‌ له‌: خێرایی زه‌ینی مرۆڤ له‌ تێگه‌یشتندا. (وه‌رگێڕ).

هۆیەوە ناکۆکیی ئەوتۆ لـە نێوانیـان سەرنشینانیدا دروست دەبێت کـە پشێوی و ئـاڵۆزی و بەیـەکدادان بنێتـەوە، دیـارە بـەم کـارەش دەرگـای: تاقیکردنـەوە و پێشـبڕکێ لـە "مـرۆڤ" کراوەتەوە و، پلە و پایەکانی "بەرزبوونەوە" و "نزم بوونەوە"یشیان لە لا دەرکەوتووە.

حیکمەتی ئەم ڕاستییەش بریتییە لەوەی کە:

مرۆڤ دوا بـەروبوومی درەختی بەدیهاتووانـە.. خـۆ ئاشـکرایە کـە "بـەر" دوورتریـن و نیانترین و جەمترینی بەدیـهاتووانی توانسـتی پـەروەردگارە و، لـە هەمووشـیان زیـاتر دارای نیانی و کۆڵەواری و لاوازییە.

ئا لێرەوەیە کە لانە و نیشتەجێی ئەم مرۆڤە، کـە بریتییـە لـە گـۆی زەوی، لـە نـاوەرۆك و دروستبوونیدا بـە هاوشـان و هاوتـای ئاسمـان دانـراوە، چونکـە هەرچـەند لــە چـاو ئاسمـاندا بچووك و بێ بایەخ دیارە، کەچی "زەوی":

مەڵبەند و دڵی گەردوونە و..

جێی ناوبانگ دەرکردنی سەرجەم موعجیزاتی سنعەتی پەروەردگارە و..

شـوێنی لێدەرکـەوتن و تیشـکۆی گشـت دەوشـانەوەکانی نـاوە جوانـەکانی خـوای گەورەیە و..

مەحشەر و جێی ڕەنگدانەوەی کارسازییە ڕەهاکانی پەروەردگارە و..

بازاڕێکی سەخاوەتمەندانەی ڕەهایـە بـۆ خستنەڕووی بەدیـهاتووانی خواوەنـد، بـە تایبـەت پێش‌چاو خستنی ڕووەك و زیندەوەران بە زۆر و زەبەندەیی..

نموونەیەکی بچووکی پیشـانگای ئـەو بەدیهێنراوانەیـە کـە لـە جیـهانی دواڕۆژدا پێش‌چـاو دەخرێن و..

کارگەیـەکی ئەوتۆیـە کـە زۆر بـەخێرایی کووتـاڵی هەتاهـەتایی دەچنێـت و دیمـەنی خـێرا بگۆڕی هەمیشەیی بەرهەم دەهێنێت و..

کێڵگەیەکی بەرتەسك و بچووك و کاتییە بۆ چاندنی تۆوی باخ و بێستانە وشـك نـەبووە هەمیشەییەکان.

هـەر لەبـەر ئـەم مەزنییـە مەعنەوییـەی[1] گـۆی زەوی و گرنـگ بوونیـەتی لـە ڕووی

(١) بەڵـێ، زەوی هەرچەند بە قەبارە بچووکە، بـەڵام هاوتـای ئاسمانـەکان دەردەچێـت، چونکـە دەتوانرێـت بوترێ: کانییەکی بـەخوڕی هەمیشـە بەخشـندە لـە دەریایـەکی نەبەخشـی بێ‌سوود گەلـێ باشـترە. پاشـان گـەر شـتێك بـە "پێوەر"ێك بپێورێت و ئنجا بخرێتە لاوە، پاش ئـەوە داهاتـەکانی ئـەو شـتە بـە هـەمان پێـوەر بپێورێن و ئـەوانیش بخرێنـە لایەکی ترەوە، ئەوا ئەو ماددانە هەرچەند بە ڕواڵەت هەزاران جار لە چاو خودی پێوەرەکە گەورەتر دیـارن، کـەچی دەکرێ پێوەرەکە هاوتای ئەو بارستاییە بێت و لەگەڵ ئەودا بەراورد بکرێت!

سنعه‌ته‌وه كه قورئانی پیرۆز به هاوشان و هاوتای ئاسمانه‌كان داینـاوه، هه‌رچـه‌ند سـه‌باره‌ت بـه ئاسمانه‌كان وه‌ك به‌ریَك وایه له چاو دره‌خته زه‌به‌لاحه‌كه‌ی‌دا. ده‌بینیت قورئانی پیرۆز هه‌میشـه زه‌وی ده‌خاتـه تایـه‌كی تـه‌رازوو، ئاسمانـه‌كانیش ده‌خاتـه تاكـه‌ی تـری و، بـه‌رده‌وام: ﴿رب السموات والأرض﴾ دووپات ده‌كاته‌وه.

پاشـان ئـه‌و ئـالۆگۆڕه خێرا و به‌رده‌وامـه‌ی كـه (بـه‌پێی ئـه‌و حیكمه‌تـه ناوبراوانـه) به‌سـه‌ر ڕووی زه‌وی‌دا دێـت، داخـوازی ئـه‌وه‌ن كـه سه‌رنشینانیشـی ئـالۆگۆڕی هاوچه‌شـنی ئـه‌وه‌ی زه‌وی‌یان به‌سه‌ردا بێت.

ئنجـا هه‌رچـه‌ند زه‌وی لـه خۆی‌دا سنووردار و بچووكه، كـه‌چی گه‌لـێ دره‌وشـانه‌وه‌ی توانستی ڕه‌های خواوه‌ندی ده‌ستگیر بووه، چونكه توانـا و لێهاتنـه‌كانی سه‌رنشـینانی خـاوه‌ن پایه و بایه‌خ پێدراوی زه‌وی - كـه جیننـی و ئـاده‌میزادن - وه‌كـو به‌دیـهاتووانی تـر نـین و هیـچ سنوورێكی سروشـتی‌یان بۆ ده‌ستنیشـان نـه‌كراوه. لـه‌بـه‌ر ئه‌وه‌یـه كـه گـۆی زه‌وی وه‌كـو پیشانگایه‌كی لـێ هـاتووه بـۆ به‌رزبوونـه‌وه‌ی لـه سـنووربه‌ده‌ر و دابـه‌زین و نزمبوونـه‌وه‌ی بێ‌كۆتایی، ئه‌وه‌تا بووه بـه مـه‌یدانێكی یـه‌كجار فراوانـی پێشـبڕكێ و تاقیكردنـه‌وه‌ی جیننـی و ئـاده‌میزاد، هـه‌ر لـه پلـه‌ی پێغه‌مبـه‌ران و پیاوچاكانـه‌وه تـا ده‌گاتـه ئاستی نـه‌مرووده زۆردار و شه‌یتانه‌كان.

جـا مـاده‌م ئه‌مـه وایـه، ئـه‌وا شـه‌یتانه فیرعـه‌ون ئاسـاكان پزیسـكی له‌ڕاده‌بـه‌ده‌ر ده‌گرنـه ئاسـمان و سه‌رنشینانی.

---

جا هه‌روه‌ك ئه‌مه له‌م نموونه‌یه‌دا وایه، گۆی زه‌ویش به هه‌مان جۆره، چونكه خوای گه‌وره بـه چه‌شـنێ دروسـتی كردووه كه:

شوێنی ناوبانگ ده‌ركردنی دروستكراوانی و.. مه‌حشه‌رێك بۆ به‌دیـهێنانی شتان و.. خولگـه‌ی حیكمـه‌ت و.. شـوێنی ده‌ركـه‌وتنی توانسـت و.. گولدانـی ڕه‌حـمـه‌ته‌كه‌ی و.. كێلگـه‌ی به‌هه‌شـت و پێـوه‌ری بوونـه‌وه‌ران - واتـه: یه‌كه‌ی پێوانه‌ی جیهانه‌كانی به‌دیهاتووان - بێت. هه‌روه‌ها زه‌ویی وا به‌دی هێنـاوه كه وه‌ك كانیـاوێكی بـه خوڕه‌مـی ئه‌وتۆ بێـت لافاوی به‌دیهـاتووانی لـێ ڕۆ بكـرێته نـاو ده‌ریاكـانی ڕابـوردوو و جیـهانی په‌نـهانی غه‌یبـه‌وه و.. وه‌ك به‌ژنوبالآیه‌كی ئه‌وتۆش به‌دیی هێناوه كه هه‌موو سالـێك سه‌دان هه‌زار جۆر شكڵ و شێوه‌ی یه‌ك له دوای یه‌كی له‌به‌ر ده‌پۆشێت له‌و پۆشاكانه‌ی كه سنعه‌تی ناوازه‌ی ئه‌و چنیونی و ڕازاندوونیه‌وه.

ئێستا ئه‌و جیهانه زه‌به‌نده‌ی كه له جیهانی په‌نهانی غه‌یبدا ڕۆ ده‌كرێن و، ئه‌و پۆشاكه زۆرانـه‌ش كـه زه‌وی یـه‌ك له دوای یه‌ك له‌به‌ریان ده‌كات و پاشان دایانده‌مالێت، بهێنه‌ره پێش چاوی خۆت. واتـه وا دابنـێ كـه هـه‌رچی لـه‌ناو زه‌وی‌دا هه‌یه پێكه‌وه له پێـش چـاوتدا ئاماده بن، ئنجـا زه‌وی له‌گـه‌ڵ ئـه‌و ئاسمانانـه‌دا - كـه هـه‌موو ئاسـانن و تێكـڕا له‌سـه‌ر یـه‌ك ڕه‌وت و شـێوه‌ن - ڕابگـره و بـه‌راوردی بكـه، ده‌بینیـت گـه‌ر تـای تـه‌رازووی زه‌وی لـه هـی ئاسمانـه‌كان قورستر نه‌بێت، ئه‌وا هیچی له‌وان كه‌متر نابێت. ئا لێره‌وه له نهێنی ئایه‌تی پیرۆزی: ﴿رب السـموات والأرض﴾ تێ‌ده‌گه‌یت! (دانه‌ر)

□ **پلەی چوارەم:**

پەروەردگار و بەدیهێنەر و کارساز و بەخشندەی شکۆمەندی هەموو جیهانەکان، گەلێ ناوی جوانی هەیە کە حوکمی هەریەکەیان لەوانی تر جیایە و ناونیشانیان لە یەکتر جیاوازە. بۆ نموونە: ئەو ناو و ناونیشان و سیفەتەی خواوەند کە داخوازی ناردنی مەلائیکەت بوون تاکو لە ڕیزی هاوەڵە بەڕێزەکان و لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دژی کافران بجەنگن، هەر هەمان ناونیشان و سیفەت و ناون کە داخوازی "بوون"ی جەنگ و موجاهەدەشن لە نێوان مەلائیکەت و شەیتانەکاندا و، داواکاری ئەوەن کە زۆرانبازی هەبێت لە نێوان ئاسمان نشینانی چاکەکار و خراپکارانی سەرنشینی زەویدا.

خواوەندی بەتوانا و شکۆمەند کە گیان و هەناسە و دەروونی کافرانی لە دەستی توانستی خۆیدا ڕاگرتووە، نە بە هاوار(صیحة)ێك و نە بە فەرمانێکی خۆی، کافران لەناو نابات، بەڵکو بە ناونیشانی: "پەروەردگارێتیی گشتی"ی خۆی و بە خواستی ناوە جوانەکانی هاوچەشنی: "الحكيم والمدبر" دەرگای گۆڕەپانی پێشبڕکێ و تاقیکردنەوە دەخاتە سەرپشت.

بۆ نموونە (وەك وتراویشە: نموونە قڕە و بڕەی لەسەر نییە): دەبینین "پادشا" بە گوێرەی جۆراوجۆریی فەرمانگەکانی حکوومەتەکەی، چەند ناونیشان و ناوێکی جیاجیای هەیە. ئەوەتا فەرمانگەی "دادگەری" بە ناوی "فەرمانڕەوای دادگەر" پادشا دەناسێت و.. فەرمانگەی سەربازیش بە ناوی: "فەرماندەی گشتی".. بەڵام فەرمانگەی مەشیەخەت بە ناوی: "خەلیفە" و فەرمانگەی ڕەسمییش بە ناوی "پادشا" دەیناسن.. ئنجا هاووڵاتییانی گوێڕایەڵ بە "پادشای میهرەبان" ناوی دەبەن، کەچی کەسانی سەرپێچیکار و یاخیبووان لە یاسا ناوی "فەرمانڕەوای توندوتیژ"ی لێ دەنێن!

بەم جۆرە، ئەو پادشا خاوەن شکۆیە، کە جڵەوی کاروباری سەرجەم دانیشتووانی وڵاتی خۆی بەدەستە، ناچێت ـ بە فەرمانێکی خۆی ـ کەسێکی سەرپێچیکاری کۆڵەواری زەلیل لەناو ببات، بەڵکو بە ناوی "فەرمانڕەوای دادگەر" دادگایی دەکات. پاشان هەر ئەو پادشایە ناچێت بەپێی زانیاریی خۆی و لە ڕێی تەلەفۆنی ڕاستەوخۆی تایبەتیی خۆیەوە ئاوڕی ڕێز و پاداشت لە کارمەندێکی شایستە و لێهاتووی خۆی بداتەوە، بەڵکو مەیدانی پێشبڕکێ دەکاتەوە و پێشوازیی ڕەسمیی بۆ ئامادە دەکات و فەرمان بە وەزیرەکەی دەدات و هاووڵاتییانیش بانگ دەکات تاکو ئامادەی بینینی ئەو پێشبڕکێیە ببن. پاشان بە ناوی دەستەی دەوڵەت و کارگێڕیی حکوومەتەوە پاداشتی ئەو کارمەندەی دەداتەوە. بەم پێیە لە بەرامبەر ڕاستی و بێفێڵیی ئەو فەرمانبەرەوە و، پاش برینی تاقیکردنەوەیەکی سەخت بۆ چەسپاندنی شایستەیی و لێهاتنی، لەناو ئەو مەیدانە و لە بەرچاوی خەڵکانێکی زۆر لە

كه‌سانی به‌رز و به‌ڕێزدا، پاداشته‌كه‌ی ڕاده‌گه‌یه‌نێت و ئاوڕی ڕێز و چاكه‌ی لێ ده‌داته‌وه.

به‌ وێنه‌ی ئه‌م نموونه‌یه (ولله المثلُ الأعلى): خوای گه‌وره‌ گه‌لێ ناوی جوان و كاروبار و ناونیشانی زه‌به‌نده‌ی هه‌یه‌ و، خاوه‌نی چه‌ندین دره‌وشانه‌وه‌ی "شكۆمه‌ندی" و دیارده‌ی "جوانی"یه. جا ئه‌و ناونیشان و كاروبار و ناوه‌ی خوای گه‌وره‌ كه‌ داخوازی "بوون"ی ڕووناكی و تاریكی.. هاوین و زستان.. به‌هه‌شت و دۆزه‌خه، داخوازی ئه‌وه‌یشه‌ كه‌ تا ڕاده‌یه‌ك یاسای زۆرانبازی (به‌ چه‌شنی یاسا گشتی و شامیله‌كانی تری وه‌ك یاسای وه‌چه لێخستنه‌وه‌ و یاسای پێشبڕكێ و یاسای هاوكاری و هاوچه‌شنیان) بێت به‌ یاسایه‌كی گشتی و عموومی و هه‌مه‌لایه‌نگیر. واته‌ داخوازی ئه‌وه‌ ده‌بێت كه "یاسای زۆرانبازی" هه‌ر له‌ زۆرانی نێوان ئیلهام و وه‌سوه‌سه‌ی ده‌وری دڵه‌وه، بگرێته‌وه، تا ده‌گاته‌ زۆرانی نێوان مه‌لائیكه‌ت و شه‌یتانه‌كان، له‌ ئاسۆی ئاسمانه‌كاندا.

**❐ پله‌ی پێنجه‌م:**

پاشان مادەم ڕۆشتن له‌ زه‌وی‌یه‌وه بۆ ئاسمان و هاتنه‌وه‌ش له‌وێوه‌ بۆ زه‌وی هه‌یه، ئه‌وا دابه‌زین له‌ ئاسمانه‌وه‌ و سه‌ركه‌وتنیش به‌ره‌و ئه‌وێ له‌ گۆڕێدایه. ته‌نانه‌ت پێداویستی‌یه‌كانی زه‌وی له‌وێوه‌ ڕه‌وانه‌ ده‌كرێن و بۆ سه‌ر زه‌وی ده‌نێررێن.

ئنجا مادەم ڕۆحیانه‌ته‌ خاوێنه‌كان له‌ زه‌وی‌یه‌وه‌ به‌ره‌و ئاسمان ده‌ڕۆن، ئه‌وا ڕۆحیانه‌ته‌ چه‌په‌ڵه‌كانیش ده‌یانه‌وێت لاسایی‌یان بكه‌نه‌وه‌ و هه‌وڵ ده‌ده‌ن – وه‌ك ئه‌وان – بۆ ئاسمانه‌كان بڕۆن، چونكه "ڕۆح" سیفه‌تی سووكوسۆڵی و نیانیی تێدایه‌ و ده‌توانێت به‌رز ببێته‌وه. دیاره له‌م چه‌شنه‌ حاڵه‌تانه‌دا سه‌رنشینانی ئاسمان ئه‌و ڕۆحانی‌یه‌ چه‌په‌ڵانه‌ وه‌رناگرن و له‌به‌ر شه‌ڕ و خراپه‌ی ناو سروشتیان، له‌وێ ده‌ریان ده‌كه‌ن.

پاشان ده‌بێ له‌ جیهانی بینراو(عالم الشهادة)دا نیشانه‌یه‌ك هه‌بێت له‌سه‌ر ئه‌م مامه‌ڵه گرنگ و "زۆران"ه‌ مه‌عنه‌وی‌یه، چونكه "مه‌زنیی په‌روه‌ردگاریتی" داخوازی ئه‌وه‌یه‌ كه ئاماژه‌ و نیشانه‌ له‌سه‌ر كاروباره‌ غه‌یبی‌یه‌كانی خواوه‌ند دابنێت، تاكو خاوه‌ن هه‌ست و شعووره‌كان ببینن، به‌ تایبه‌ت مرۆڤی هه‌ڵگری به‌رزترین فه‌رمانبه‌ری (كه‌ ئه‌ركی بینین و شایه‌تی‌دان و بانگه‌واز كردن و سه‌رپه‌رشتی‌یه‌ له‌ ئه‌ستۆی‌دا).

جا هه‌روه‌ك خواوه‌ند بارانی كردووه‌ به‌ ئاماژه‌یه‌ك بۆ موعجیزاتی به‌هار و، هۆكاره ڕواڵه‌تی‌یه‌كانیشی كردووه‌ به‌ نیشانه‌ له‌سه‌ر كاره‌ ده‌راساكانی سنعه‌تی خۆی و خه‌ڵكی جیهانی بینراوی له‌سه‌ر كردوون به‌ شایه‌ت و بینه‌ر، بێ هیچ گومانێك، ئه‌و خواوه‌نده سه‌رنجی هه‌موو سه‌رنشینانی ئاسمان و زه‌ویش بۆ ئه‌و دیمه‌نه‌ مه‌زن و سه‌رسووڕهێنه‌ره ڕاده‌كێشێت و، ئه‌و ئاسمانه‌ مه‌زنه‌ له‌ شێوه‌ی قه‌ڵایه‌كی مه‌حكه‌می ئه‌وتۆدا ده‌رده‌خات كه بورجه‌كانی به‌ پاسه‌وانی ڕیزبه‌ستوو له‌ ده‌وری‌دا ڕازێنرابێته‌وه، یان وه‌ك شارێكی ئاوه‌دان كه

تاسه‌مه‌ندیی ئه‌هلی بیر بۆ تێڕامان و بیرکردنه‌وه‌ ده‌جووڵێنێت.

مادەم ڕاگەیاندنی ئەو "زۆرانبازی"یە بەرزە گەلێ پێویستە و "حیکمەت" داخوازیەتی، ئەوا دەبێ نیشانەیەك هەبێت لە سەری، کەچی لە نێوان ڕووداوە ئاسمانییەکاندا، ڕووداوێکمان بەرچاو ناکەوێت کە لەگەڵ ئەم ڕاگەیاندنەدا بگونجێ، جگە لەوەی کە باسمان کرد. کە تاکە ڕووداوە بە گونجاوترین و لەبارترین نیشانە دابنرێت لەسەر ئەو ڕاگەیاندنە. چونکە ڕووداوە ئاسمانییەکانی لەمەڕ ئەستێرەکان چەشنی: هاویشتنی تیرەستێرەکان(الشهب) کە وەك تیرهاویشتن وایە بە "مەنجەنیق" و کتومت لە هەڵدانی فیشەکی "تەنویر" دەچێت کە لەسەر قەڵا بەرز و بورجە بڵندەکانەوە هاوێژرابێت، لەگەڵ هاویشتنی تیرەستێرەکان بەرەو شەیتانەکان (کە قورئانی پیرۆز بە ڕاشکاوی دانی پێدا نا) گەلێ گونجاوە و یەکاویەك دەردەچێت..

دەبێ ئەوەش بزانین کە جگە لەو حیکمەت و ئامانجەی باسمان کرد، پەی بە هیچ حیکمەت و ئامانجێکی تر نەبراوە بۆ ڕوودانی تیرهاویشتن بۆ شەیتانەکان. سەرەڕای ئەوەش ڕەجم کردنی شەیتانەکان ڕووداوێکە هەر لەسەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی لەسەر بێت - بەناوبانگە و، لە لایەن ئەهلی حەقیقەتیشەوە بینراوە، بە پێچەوانەی ڕووداوەکانی تر.

❑ **پلەی شەشەم:**

لەبەر ئەوەی جینی و ئادەمیزاد توانا و لێهاتنێکی بێ سنووریان بۆ شەڕ و خراپکاری و ئینکاری و ملنەدان تێدایە، ئەوا دەتوانن پشت هەڵکردن و بێ گوێیی و لاساریی گەورە و بێ سنوور ئەنجام بدەن. بۆیە قورئانی پیرۆز لە ڕێی بەلاغەتە خاوەن ئیعجازەکەی خۆیەوە و بە چەندەها شێوازی ڕوونی بەرز، هەڕەشەی توند و تیژ لە بێ گوێیی و سنوور شکاندنی گرۆی جینی و ئادەمیزاد دەکات و گەلێ نموونەی بەرز و بەنرخ لەسەر مەبەستەکەی دەهێنێتەوە و لە چەندەها مەسەلە و کێشەی ورد دەدوێت و، بە هەموو ئەمانەش سەرزەنشت و هەڕەشەیەکی هێندە توند و تیژ لە بەرامبەر بێ گوێیی و لە سنوور لادان ئاراستەی جینی و ئادەمیزاد دەکات کە سەرانسەری گەردوون ڕادەچڵەکێنێت.

بۆ نموونە بڕوانە ئایەتی پیرۆزی:

**﴿يامَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَـوَاتِ وَالأَرْضِ فَـانفُذُواْ لا تَنفُذُونَ إِلاَّ بِسُلْطَانٍ ۞ فَبِأَيِّ ءَالآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ۞ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِنْ نارٍ وَنُحَاسٌ فَلا تَنتَصِرَانِ﴾** (الرحمن:٣٣-٣٥).

فەرموو سەرنج لەم هەڕەشە مەزن و سامناك و سەرزەنشتە توند و تیژە بدە کە لەم ئایەتەدا پێش‌چاو خراوە و، بزانە کە چۆن ئەم ئایەتە بە ڕەوانبێژییە ئیعجازبەخشەکەی خۆی فیز و

دەماری پشت هەڵکردنی جیننی و ئادەمیزاد دەشکێنێت و لە شان و باڵی غرووری ئەوان دادەگرێت و ڕادەی کۆڵەواری و دەستەوسانییان ئاشکرا دەکات و، دەری دەخات کە تا چەندە لە بەردەم مەزنیی دەستەڵات و فراوانیی پەروەردگارێتیی خواوەندیاندا لاواز و بێ دەستەڵاتن. بە ڕادەیەك کە دەڵێیت ئەم ئایەتە و ئایەتەکەی تر کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِلشَّيَاطِينِ﴾ (الملك:٥) هەردووکیان بەم شێوەیەی خوارەوە ڕووی دەمی گوفتار ئاراستەی جینني و ئادەمیزاد دەکەن:

(ئەی گرۆی جینني و ئادەمیزاد!

ئەی لەخۆبایی و هەڵگەڕاوەکان!

ئەی ئەوانەی لەناو قوڕی کۆڵەواری و لیتاوی لاوازیدا چەقیوون!

ئەی سەرسەختانی ملنەدەر کە لە ناو هەژاری و لاوازیدا دەتلێنەوە!

ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانم نابن، ئەوا - گەر لە توانادایە - لە سنووری موڵك و دەستەڵاتی من دەربچن! خۆ کە ناشتوانن ئەو سنوورە بشکێنن و لێی دەربچن ئەدی چۆن پڕ کێشیی ئەوە دەکەن کە فەرمانی پادشایەکی هێندە مەزن پشتگوێ دەخەن کە ئەستێرە و مانگ و خۆرەکانی لەدەستدایە و، هەموو ئەوانە - بە وێنەی سەربازی ئامادە و ملکەچ - گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو دەبن؟ ئێوە بەم سنوورشکاندن و یاخیبوونەتان سنگ لە فەرمانڕەوایەکی ئەوەندە گەورە دەردەپەڕێنن کە خاوەنی چەندەها سەربازی گوێڕایەڵی سامداری وەهایە کە دەتوانن چەندان بۆمبی زەبەلاحی بە ئەندازەی چیاکان بگرنە شەیتانەکانیشتان، گەر بتوانن خۆیانی لە بەردەمدا ڕابگرن!

هەروەها ئێوە، بەم کافری و ناشکوورییەتان، لە وڵاتی خاوەن موڵکێکی هێندە مەزن و شکۆداردا هەڵدەگەڕێنەوە کە چەندان سەربازی گەورە گەورەی وای هەیە دەتوانن بە چەندین پارچە ئاگر و پزیسك و بۆمبای گڕگرتووی بە ئەندازەی زەوی و چیاکان بۆمبارانی دوژمنە کافرەکان بکەن، با هەریەکە لەو دوژمنانەش ئەوەندەی زەوی و چیا سەختەکان گەورە و زەبەلاح بن و، دەتوانن لەم ڕێیەوە لەت و پەت و پەرتەوازەیان بکەن، چ جای بەدیهاتووانێکی لاوازی وەك ئێوە؟

هەروەها ئێوە سەرپێچی لە یاسایەکی جێبەجێکراوی وەها دەکەن کە کەسانێکی ئەوتۆ پەیوەستی بوون دەتوانن - بە ئیزن و فەرمانی خوای گەورە - بۆمب و ڕاجیمەی بە ئەندازەی ئەستێرەکانتان تێبگرن).

بەڵێ، قورئانی پیرۆز گەلێ سوپا و لەشکری گرنگی بۆ ئەوانە جەم کردووە. بەڵام ئەم کارە ئەوە ناگەیەنێت کە دوژمنان خاوەنی هێزێکی وەها بن ئەو لەشکرکێشییەیان لە پێناودا

بکرێت، بەڵکو لەبەر چەند هۆکارێکی تری وەك: دەرخستنی مەزنیی خوایەتیی خوای گەورە و.. ئابڕووبردن و سووکایەتی پێ کردنی دوژمنانە.

پاشان هەندێ جار ئایەتێکی پیرۆزی قورئان بەهێزترین و مەزنترینی هۆکارەکان لە بەرامبەر لاوازترین و بچووکترین شتدا کۆ دەکاتەوە و، بێ ئەوەی لاوازەکەیانی لە یاد بچێت بەراوردیان لە نێواندا ساز دەکات. ئەمەش بۆ ئەوەیە: کەماڵی ڕێکوپێکی و، ئامانجی دادگەری و، کۆتایی زانست و دانست، دەربخات.

بۆ نموونە ئایەتی: ﴿**وَإِنْ تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللهَ هُوَ مَوْلاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلآئِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ**﴾ (التحريم:٤). مەودای ئەو ڕێزە شایانەی کە لە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ نراوە و، ڕادەی ئەو میهرەبانییە فراوانەش کە مافی سەرجەمی هاوسەرەکان دەگرێتەوە، دەردەخات.

جا ئەم هێز جەم کردنە، بە چەشنێکی میهرەبانانە مەزنیی پێغەمبەر ﷺ و پلە بەرزیی لای خوای گەورە دەردەخات و.. گرنگیی سکاڵای دوو هاوسەری لاواز و، مەودای چاودێری کردنی مافەکانیان، دەخاتە ڕوو.

**□ پلەی حەوتەم:**

بە چەشنی جیاوازیی نێوان مەلائیکەتان و گەورە و بچووکیی نێوان ماسییەکان، ئەستێرەکانیش لەناو خۆیاندا جیاوازیی زۆریان لە نێواندایە. واتە هەندێ لەو ئەستێرانە تابڵێی بچووکن و هەندێکی دیکەشیان تابڵێی گەورەن، تەنانەت هەر شتێك لە ڕووی ئاسماندا بریسکێتەوە پێی دەوترێت: ئەستێرە.

بەم چەشنە، جۆرێك لە جۆر و ڕەگەزەکانی ئەستێرەکان بۆ ڕازاندنەوەی ڕووی جوانی ئاسمانن، دەڵێی بەدیهێنەری مەزن و کردگاری خاوەن جوانی بە وێنەی بەری ڕووناکیبەخشی ئەو درەختەی ئاسمان.. یان وەك ماسیی تەسبیحات گوزاری خواوەند لەو دەریا فراوانەدا.. یان بە وێنەی هەزاران مەنزڵگا بۆ مەلائیکەتانی، ئەو جۆرە ئەستێرانەی بەدی هێناوە..

هەروەها جۆرێکی بچووکی ئەستێرەکانیشی وەك ئامرازێك بۆ ڕەجم و تیربارانی شەیتانەکان بەدیهێناوە..

جا ئەو تیرەستێرانەی کە دەگیرێنە شەیتانەکان و ئەوانی پێ ڕەجم دەکرێن، سێ واتایان تێدایە:

واتای یەکەم: هێما و نیشانەن بۆ پیادەبوونی یاسای "زۆرانبازی" لە ناوەندی فراوانترین بازنەی بوونەوەراندا.

واتای دووهه‌م: ئاسمانه‌كان چه‌ندین پاسه‌وانی بێدار و دانیشتووی گوێڕایه‌ڵیان تێدایه‌. جا ئه‌م تیره‌ستێرانه‌ ئاماژه‌یه‌كن بێزاریی سه‌ربازانی خوای گه‌وره‌ ڕاده‌گه‌یه‌نن سه‌باره‌ت به‌ تێكه‌ڵبوونی دانیشتووه‌ خراپه‌كانی زه‌وی له‌گه‌ڵیاندا و دزه‌ كردنیان بۆ گوێڕاگرتن له‌وان.

واتای سێهه‌م: ئه‌م تیره‌ستێرانه‌ی كه‌ ده‌ڵێی "مه‌نجه‌نیق" و گولله‌ی ته‌نویرن، بۆ ئه‌وه‌ دانراون كه‌ جاسووسه‌كانی شه‌یتانه‌كان بترسێنن له‌وانه‌ی كه‌ به‌ دزییه‌وه‌ گوێ له‌ ئاسمان‌نشینان ڕاده‌گرن و خراپترین نوێنه‌ری خراپه‌كارییه‌كانی زه‌وین، تاكو له‌ ده‌رگاكانی ئاسمان ده‌ربكرێن و ئاسمانی خاوێن چه‌په‌ڵ نه‌كه‌ن كه‌ نیشته‌جێی به‌دیهاتووانی خاوێنه‌و، هه‌روه‌ها بۆ ئه‌وه‌ش كه‌ بواریان نه‌ده‌ن له‌سه‌ر حسابی ده‌روونه‌ چه‌په‌ڵه‌كانی زه‌وی، جاسووسی ئه‌نجام بده‌ن.

ئه‌ی گه‌ردووناسی پشت‌به‌ستوو به‌ ژیریی كورت و به‌رته‌سكی خۆی كه‌ ڕووناكی ئه‌م ژیرییه‌ی له‌ ڕووناكیی گوڵه‌ستێره‌ تێپه‌ڕ ناكات! ئه‌ی ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ له‌ ئاستی ڕووناكیی خۆری قورئانی پیرۆزدا چاوی ده‌نووقێنێ!

به‌ "یه‌ك جار" سه‌رنج له‌م ڕاستییانه‌ بده‌ كه‌ ئه‌م حه‌وت پله‌یه‌ ئاماژه‌یان بۆ ده‌كه‌ن.. چاوه‌كانت واڵا بكه‌و، واز له‌ ترووسكایی ژیریت بهێنه‌و، واتای ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌ له‌ نووری ئیعجازه‌كه‌یدا ببینه‌ كه‌ به‌ چه‌شنی ڕۆژی ڕۆشنا ڕوون و ئاشكرایه‌، ئنجا ئه‌ستێره‌ی یه‌ك حه‌قیقه‌ت له‌ ئاسمانی ئه‌و ئایه‌ته‌ هه‌ڵبگره‌ و تیرباران و ڕه‌جمی ئه‌و شه‌یتانه‌ی پێ كه‌ كه‌ له‌ ناو زه‌ینتدا خۆی مه‌ڵاس داوه‌! ئێمه‌ش له‌ لایه‌نی خۆمانه‌وه‌ هه‌ر وا ده‌كه‌ین.

جا با پێكه‌وه‌ بڵێین:

﴿ربِّ أعوذُ بكَ مِنْ هَمَزاتِ الشَّياطين﴾.

فلله الحجةُ البالغةُ والحكمةُ القاطعة.

﴿سبحانك لا علمَ لنا إلاّ ما علَّمْتَنا إنك أَنت العليم الحكيم﴾[1].

(١) پاشكۆی وته‌ی پازده‌هه‌م بریتییه‌ له‌ به‌شی یه‌كه‌می مه‌كتووبی بیست و شه‌شه‌م (به‌ ناوی: به‌ڵگه‌ی قورئان بۆ ده‌مكوتكردنی شه‌یتان و حیزبه‌كه‌ی). تكایه‌ با له‌وێ سه‌یر بكرێت. (وه‌رگێڕ)

# وتەی شازدەهەم

بسم الله الرّحـــمنِ الرّحيم

﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ ۞ فَسُبحانَ الّذِي بِيَدِهِ مَلكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (يس:٨٢ – ٨٣)

**بە پیشاندانی چوار تیشکی نووری ئەم ئایەتە پیرۆزە بۆ نەفسی خۆم، ئەم وتەیەم نووسی، تاکو بینایی بە نەفسی کوێرم ببەخشێت و تاریکییەکانی دەوروبەری بڕەوێنێتەوە و ببێت بە مایەی دڵنەوایی بۆی.**

**○ تیشکی یەکەم:**

ئەی نەفسی نەزانم! تۆ دەڵێیت:

تەنیایی زاتی خوای گەورە، هاودەم لەگەڵ هەمەکیبوونی کارەکانیدا و.. یەکبوونی زاتی ئەو، هاودەم لەگەڵ گشتیبوونی پەروەردگارێتییە بێیاریدەدەرەکەیدا و.. تاکیی ئەو خواوەندە، لەگەڵ شموولی هەڵسوکەوتە بێ هاوبەشەکانی لە هەموو شتێکدا و.. ئامادەبوونی لە هەموو شوێنێکدا، لەگەڵ بێمەکانییدا و.. بەرزیی ڕەهای ئەو، لەگەڵ نزیکبوونیدا لە هەموو شتێکەوە و.. یەکتایی ئەو، هاودەم لەگەڵ ئەوەی کە جڵەوی هەموو شتێکی ڕاستەوخۆ لە دەستدایە..

هەموو ئەمانە، چەند ڕاستییەکی قورئانن و.. دەشڵێیت: قورئان دانایە، خۆ "دانا"یش کارێك بە ژیری ناسپێرێت کە بۆی وەرنەگیرێت. کەچی ئەوەتا "ژیری" نەگونجانێکی ڕواڵەتی لە نێوان ئەم شتانەدا دەبینێت. لەبەر ئەوە، دەمەوێت ئەم کێشەیەم بە چەشنێك بۆ ڕوون بکەیتەوە کە ژیری ناچاری تەسلیم بوون بکات!

**وەلام:**

مادەم لەم بوارەدا بە دوای دڵنیاییدا دەگەڕێیت، ئەوا پشت بە ڕێژنەی قورئانی پیرۆز دەبەستین و دەڵێین:

نـاوی "النـور" كـه یه‌كێكـه لـه نـاوه جوانـه‌كان، گه‌لـێ كێشـه‌ی زۆری بـۆ شـی كردووینه‌ته‌وه، پشت به‌خوا ئه‌م مه‌سه‌له‌یه‌شمان بۆ شی ده‌كاته‌وه.

وا له خواره‌وه‌دا بۆ ئه‌م مه‌به‌سته ڕێگای نموونه‌هێنانه‌وه ده‌گرینه‌به‌ر، كـه ڕێگایـه‌كی ڕوونـه بۆ "ژیـری" و ڕوونـاكیش ئاراسـته‌ی "دڵ" ده‌كـات و، وه‌ك ئیمـامی ڕه‌ببـانی (ئه‌حـمه‌دی فارووقیی سه‌رهه‌ندی) فه‌رموویه‌تی، ئێمه‌ش ده‌ڵێین:

نه شـبم نه شـب پرسـتم مـن      غلام شمسم أز شمس می گويم خبر[1]

چونكـه مـادەم "نموونـه هێنانـه‌وه" دره‌خشـانترینی ئاوێنـه ئیعجـاز ده‌رخـه‌ره‌كانی قورئانـه، ئێمه‌ش ناچارین كه ئه‌م نهێنی‌یه له‌م ڕێیه‌وه ڕوون بكه‌ینه‌وه و ده‌ڵێین:

ته‌نها یـه‌ك كـه‌س بـه‌هۆی چـه‌ند ئاوێنه‌یـه‌كی جۆراوجـۆره‌وه سیفه‌تی "هه‌مـه‌كێتی"(كلـي) به‌ده‌ست ده‌هێنێت. واتـه لـه كـاتێكدا كـه ئـه‌و شـتێكی "هـه‌نده‌كی"(جزئي)ی ڕاسـته‌قینه‌یه، كه‌چی - به‌و هۆكاره - وه‌ك هه‌مه‌كی‌یه‌كی ئه‌وتۆی لـێ دێت كه خاوه‌نی گه‌لـێ كاروبـاری گشتی بێت..

بۆ نموونه: "خۆر" كه هه‌نده‌كی‌یه‌كی دیاری‌كراوه، به‌هۆی شـته ڕوون و بریقه‌داره‌كانه‌وه ده‌چێته حوكمی هه‌مه‌كی‌یه‌وه، به ڕاده‌یه‌ك كه سه‌ر ڕووی زه‌وی لـه وێنـه و تیشـكدانه‌وه‌كانی خۆی پڕ ده‌كات، ته‌نانه‌ت به ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی دڵۆپـه ئاوه‌كـان و گـه‌ردیلـه بریسـكه‌داره‌كان دره‌وشانه‌وه به‌ده‌ست ده‌هێنێت.

ئنجا هه‌ریه‌ك له گه‌رمی و ڕووناكیی خۆر و هه‌ر حه‌وت ڕه‌نگه‌كانی، سه‌رجه‌م ئـه‌و شتانه ده‌گرنه‌وه كه له به‌رامبه‌ریانه‌وه‌ن، له هه‌مان كاتیشدا هه‌موو شتێكی ڕوون و بریقه‌دار جگه له وێنـه‌ی خۆر، گـه‌رمی و ڕوونـاكی و حـه‌وت ڕه‌نگـه‌كانی خۆریـش لــه‌ناو بیلبیلــه‌ی چـاوی خۆی‌دا جێگا ده‌كاته‌وه و دڵه خاوێنه‌كه‌ی خۆی ده‌كات به عه‌رشێك بۆ هه‌موو یه‌كێ له‌وان.

واته هه‌روه‌ك "خۆر" به سیفه‌تی تاكی(واحدیة)ی خۆی هه‌موو ئه‌و شتانه ده‌گرێته‌وه كه له به‌رامبــه‌ریه‌وه‌ن، له هـه‌مـان كاتدا و له ڕووی سیفه‌تی ته‌نیـایی(أحدیــة)ی خۆیشــیه‌وه بـه

---

(١) له چاپه فارسی‌یه‌كه‌ی مه‌كتووباتی ئیمامی ڕه‌ببانی‌دا به‌م جۆره نووسراوه: (ج١/ص٢٤ مكتوب شماره ١٤٣)

چـــو غلام آفتابم همه از آفتاب گويم      نه شبم نه شب پرستم كه حديث خواب گويم

له چاپه عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌ش‌دا به‌م جۆره هاتووه: (ج١/ص١٢٤ المكتوب ١٣٠ ، ج٢/ص١٠٣ المكتوب ٥٨)

وإنـــي غلام الشمس أروي حديثها      فما لـــي والليل فـــأروي حـــديثه؟!

(وه‌رگێڕ)

جۆرێك لە جۆرەكانی درەوشانەوەی زاتی خۆی (هاودەم لەگەڵ هەموو تایبەتكاری و سیفەتە زۆرەكانی‌دا) لە هەموو شتێكدا ئامادەیە.

مادەم لە نموونە هێنانەوە(التمثیل)وە بۆ خۆنواندن(التَّمَثُّل) گواستمانەوە، ئەوا ئاماژە بۆ سێ جۆری خۆنواندن دەكەین، تاكو ببێت بە تەوەرەی ئەم باسەمان:

**یەكەمیان:** وێنەی "شتانی ماددیی چڕ" لەناو ئاوێنەكاندا، غەیری ئەو شتانەیە و خودی خۆیان نی‌یە و، چەند مردوویەكن جگە لە وێنە ڕواڵەتی‌یەكەی ئەو شتە ماددی‌یە خاوەنی هیچ تایبەتكاری‌یەكی تری ئەو نین. بۆ نموونە: ئەگەر تۆ - ئەی سەعید! - بڕۆیتە ناو كۆگای ئاوێنەكانەوە ئەوا ئەم یەك "سەعید"ە دەبێت بە هەزار! بەڵام تەنها یەك دانە سەعید - كە خۆتیت - لە نێوان ئەم هەزاران سەعیدەدا خاوەنی ژیانە و، هەموو ئەوانی تر مردوون و تایبەتكاریی ژیانیان تێدا نی‌یە.

**دووهەمیان:** وێنەی "نوورانی‌یە ماددی‌یەكان" لە ئاوێنەكانیاندا هەروەك خودی خۆیان نی‌یە، لە هەمان كاتدا غەیری خۆشیان نی‌یە! چونكە ئەو وێنانە گشت لایەنەكانی ماهییەتی ئەو نوورانی‌یە ماددی‌یە ناگرنەوە، بەڵام خاوەنی زۆربەی تایبەتكاری‌یەكانی ئەو نوورانی‌یە ماددی‌یەن، بۆیە - وەك ئەو - بە خاوەن ژیان دادەنرێن.

بۆ نموونە:

كاتێ كە خۆر تیشكی خۆی بەسەر گۆی زەوی‌دا پەخش دەكات، وێنەكەی خۆی لە هەموو ئاوێنەیەكدا دەردەخات.. كەواتە هەموو وێنەیەكی خۆر لەو ئاوێنانەدا دارای چەند تایبەتكاری‌یەكی هاووێنەی تایبەتكاری‌یەكانی خۆرە، چ ڕووناكی و چ حەوت ڕەنگەكانی خۆر. گریمان خۆر خاوەن هەست بێت و، گەرمی‌یەكەی بریتی بێت لە توانستی و، ڕووناكی‌یەكەشی بریتی بێت لە زانستی و، حەوت ڕەنگەكانیشی بریتی بن لە حەوت سیفەتەكانی، ئەوا خۆری تاكی تەنیا لە یەك كاتدا لەناو هەموو ئاوێنەیەكدا ئامادە دەبوو، هەریەك لەو ئاوێنانەشی دەكرد بە جۆرە تەلەفۆنێك و عەرشێكی تایبەتی بۆ خۆی و هیچ شتێك ڕێی لە هیچ شتێكی تر نەدەگرت و، ئەو كاتە دەتوانرا هەر بەو ئاوێنەیەی لەناو دەستماندایە ڕووبەڕووی هەموو یەكێك لەوانە ببوایەتەوە. هەروەك ئێمە لە خۆرەوە دووریـن كەچی ئەو لە خۆمان نزیكترە لێمانەوە.

**سێهەمیان:** وێنەی "ڕۆحیانەتە نوورانی‌یەكان" لەناو ئاوێنەكانیاندا چەند وێنەیەكی زیندوون و لە هەمان كاتدا خودی خۆشیانن، بەڵام لەبەر ئەوەی دەركەوتنیان لەناو ئاوێنەكاندا بەپێی توانا و لێهاتنی ئەو ئاوێنانە دەبێت، ئەوا ئاوێنەكان جێگای ماهییەتی زاتی ڕۆحیان تێدا نابێتەوە.

بۆنموونـە: حـەزرەتی جوبریـل - درودی خـوای لەسـەر بێـت - لـەو کاتـەدا کـە لەسـەر شێوەی هاوەڵی بەڕێز "دحية الكلبي" ئامادەی کۆڕی پێغەمبەر ﷺ دەبوو، هـەر لـەو کاتـەدا بـە باڵە خاوەن سام و شکۆکانیەوە لە بەردەم عەرشی بەزنی خوای گەورەدا سـوژدەی دەبـرد و، هەر لە هەمان کاتیشدا لە گەلـێ جێگەی زۆر و زەبەندەدا ئامادە دەبوو، چونکە فەرمانەکانی خوای گەورەی لەو شوێنانەدا ڕادەگەیاند! هیچ کام لەم کارانەش ڕێگای کـارێکی دیکـەیان لـێ نەدەگرت.

لەم نهێنییەوە تێدەگەین کە چۆن:

پێغەمبەر ﷺ لە یەك کاتدا سلاواتی سەرجەم نەتەوەکـەی لـە هـەموو شـوێنێکدا دەبیستێ، چونکە ماهیەتی پێغەمبەر ﷺ نوورە و هەوییەتەکەشی نوورانییە..

هەروەها تێدەگەین کە چۆن پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی قیامەت لە یـەك کـاتدا چـاوی بـە هـەموو "أصفياء"ی نەتەوەکەی دەکەوێت، بێ ئەوەی بینینی یەکێکیان ڕێ لە چاوپێکەوتنی یـەکێکی تریان بگرێت..

تەنانەت کەسانێك هەن لە نێوان ئـەولیاکاندا کـە نوورانیێتیی زیادیـان بەدەسـت هێنـاوە و ناوی "أبدال" یان لـێ نراوە، لە یەك کاتدا لە گەلـێ جێگای جیاجیادا دەبیـنرێن، دەڵـێن کـە تەنها یەك کەس لەوان لە یەك کاتدا گەلـێ کاروباری جیاواز ئەنجام دەدات، چونکە هەروەك شوشە و ئاو و مادده هاوچەشنەکانیان دەبن بە ئاوێنەی تەنە ماددییەکان، هەوا و "ئەثـــیر" و گـەلـێ بـوونەوەری تری جیهانی میسالیش وەك چەنـد ئـاوێنە و هـۆکارێکی گواسـتنەوەی بـە ئـەندازەی خێرایی ئەندێشـە و هەورەتریشـقەیان لـێ دێـت بـۆ ڕۆحانیـیـەکان، ئیـتر ئـەو ڕۆحانییانـە، بـە ئـەندازەی خێرایی ئەندێشـە، لـەناو ئـەو مـەنزڵگا جـوان و ئاوێنـە خاوێنانـەدا هاتوچۆ دەکەن و لـە یەك کاتدا دەڕۆن بۆ هەزاران جێگا.

لە کاتێکدا کە بوونەوەرانی دەستەوسانی ڕامکراوی وەك "خۆر" و چەند بەدیهاتوویـەکی نیمچە نوورانیی پابەندی مادده وەك "شتانی ڕۆحانی"، بگونجـێ بـەهۆی "نوورانیێتـی"یـەوە لـە تەنها یەك کاتدا لە جێیەکی تایبەتی و لە هەمان کاتدا لە چـەندین جێـی تریشـدا ئامـادە بێـت، چونکە لـەو کاتـەدا کـە ئـەو بوونـەوەرە لـە خۆیدا پابەند و بەسـتراوەیە، کـەچی حوکمـی کوللییەکی گشتی و ڕەها وەردەگرێـت و بـە ئیختیـارە جوزئییەکـەی خـۆی گەلـێ کـاری زۆر لە تەنها یەك کاتدا ئەنجام دەدات..

لـە کـاتێکدا کـە ئـەم بوونـەوەرە لاواز و بەدیـهاتووە نیمچـە نوورانییانـە وابـن، دەبێ ئـەو کەسە چۆن بێت کە خاوێنە لە ماددیـیـەت و لـەوەش کـە بـە "سـنوور" دەستنیشـان بکرێـت و. هەرگیز تاریکایی "چرووپری" - کە سیفەتی ماددەیە - توخنی ناکـەوێت. تەنانـەت ئـەم هـەموو

ڕووناکی و شتە نوورانی‌یانە تەنها چەند سێبەرێکی چڕی ڕووناکی‌یەکانی ناوە جوانەکانی ئەون.. بگرە سەرجەمی بوونەوەران و ژیان و جیهانی ڕۆح و جیهانی میسالیش تەنها چەند ئاوێنەیەکی ڕوونی دەرخستنی جوانیی ئەو خواوەندە خاوێن و مەزنەن کە سیفەتەکانی دەورەی هەموو شتێکیان داوە و کاروبارەکانیشی هەموو شتێکیان گرتووەتەوە..

ئایا دەبێت چ شتێك هەبێت بتوانێت ڕووی خۆی لە ڕووتێکردنی "تەنیایی" ئەو بشارێتەوە، کە لە نێوان درەوشانەوەی سیفەتە گشتگیر و کاروبارەکانیدا دەدرەوشێتەوە، ئەوانەی کە بە ویستی هەمەکی و توانستی ڕەها و زانیاریی بە هەموو شت ئاگای ئەو دەردەکەون؟ یان کام شت بە لایەوە گران دەبێت و.. چ شتێك دەتوانێت خۆی لێ بشارێتەوە و.. چ تاکێك بۆی دەکرێت لەو دوور بێت و.. چ کەسایەتی‌یەك دەتوانێت - بێ ئەوەی هەمەکێتی بەدەست بهێنێت - لەو نزیك ببێتەوە؟

بەڵێ، "خۆر" بەهۆی ڕووناکی‌یە ڕەها نەبەستراوەکەی و وێنە نامادی‌یەکانی لەناو ئاوێنەکاندا، لە گلێنەی چاوت نزیکترە لێتەوە، کەچی تۆ بە جۆرێکی ڕەها لەو دووریت! چونکە تۆ بە وێنەی ئەو ڕەها نیت، بەڵکو پابەندی گەلێ شتی ئەوتۆیت کە لە خۆر دوورت دەخەنەوە. جا بۆ ئەوەی لە "خۆر" نزیك ببیتەوە، دەبێ لە گەلێ پەیوەندی و پابەندیی ماددی خۆت داماڵیت و زۆر پلە و پایەی هەمەکی ببڕیت، کە ئەمەش داخوازی ئەوەیە بە ئەندازەی گۆی زەوی گەورە ببیت و بەقەدەر مانگیش بەرز ببیتەوە تاکو بتوانیت - تا ڕادەیەك - لە پلەی ڕاستەقینەی خۆرەوە نزیك ببیتەوە و بێ پەردە ڕووبەڕووی ڕابوەستیت!

هەروەك ئەمە سەبارەت بە خۆرەوە وایە، خواوەندی مەزنی "ذو الجمال" و جوانی "خاوەن کەماڵ"یش - ولله المثل الأعلى - بە هەمان جۆرە، چونکە ئەو خواوەندە لە هەموو شتێکی‌تر لە تۆوە نزیکترە، کەچی تۆ بە ڕادەیەکی لە سنووربەدەر لەو دووریت. خۆ ئەگەر هێز و توانا لەناو دڵتدا و "بەرزی"یش لە ژیریی خۆتدا شك دەبەیت ئەوا هەوڵ بدە ئەو خاڵانەی لەناو نموونەکەدا هاتن، بەسەر "حەقیقەت"دا تەتبیقیان بکە.

❍ **تیشکی دووهەم:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿**إنّما أَمْرُهُ إذا أَرادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَه كُنْ فيكون**﴾ (يس:٨٢).

هەروەها دەفەرموێ: ﴿**إنْ كانَتْ إلاّ صَيحةً واحدةً فإذا هُمْ جَميعٌ لَدينا مُحْضَرون**﴾(يس:٥٣).

ئەی نەفسی بێ ئاگام! تۆ دەڵێیت:

ئەم ئایەتە پیرۆزانە و هاوچەشنیان ئەوە دەگەیەنن کە شتان تەنها بە یەکجار و فەرمانێکی خوایی بەدیهێنراون و پەیدا بوون، کەچی ئەم ئایەتانەی تر: ﴿**صُنْعَ اللهِ الَّذي أَتقَنَ كُلَّ**

شَيءٍ﴾(النمل:٨٨) و ﴿أَحْسَنَ كُلَّ شَيءٍ خَلَقَهُ﴾ (السجدة:٧) هەروەها ئایەتەكانی تری هاوچەشنیان دەری دەخەن كە شتان بە لەسەرخۆیی و هەنگاو بە هەنگاو لە رێی توانستێكی مەزن و زانستێكی هەمەلایەنگیر و وردەكاری‌یەكی نێوان دانستێكی لەرادەبەدەردا، بەدی هێنراون.

ئایا بە چ رێگایەك ئەم دوو چەشنە ئایەتانە یەك دەخرێن؟

**وەڵام:**

پشت بە رێژنەی قورئانی پیرۆز دەبەستین و دەڵێین:

یەكەم: هەرگیز ئەم ئایەتانە پێچەوانەی یەكتر نین ، چونكە هەندێ لە بوونەوەران بەو جۆرە دروست دەكرێن كە ئایەتەكانی یەكەم دەریانخست، وەك: دروستكردنی یەكەم جار.. كەچی بەشێكی تری بوونەوەران بەو جۆرە بەدی دەهێنرێن كە ئایەتەكانی تر باسیان كرد، بە وێنەی: هێنانەوە و دروستكردنەوەی هاوچەشنی بوونەوەرانی پێش خۆیان.

دووهەم: ئەوپەڕی رێسا و وردەكاری و ئەوپەڕی جوانی و سنعەت و كەماڵی بەدیهێنان، لە ناوەندی ئاسانی و خێرایی و زۆری و فراوانی‌دا، بە بوونەوەرانەوە دەبینرێن، بە رادەیەك كە شایەتی‌یەكی رەها لەسەر راستیی ئەم دوو جۆرە بەدیهێنانە دەدەن. كەواتە هیچ پێویست ناكات لە دەرەوەی ئەو شتانەدا، لەسەر هاتنەدی‌یان، مرۆڤ خەریكی لێكۆڵینەوە بێت (چونكە بە بەرجەستەیی لە بەرچاودان). بەڵام جێی خۆیەتی پرسیار بكرێت و بوترێت: نهێنیی حیكمەت لەم دوو جۆرە بەدیهێنانەدا چی‌یە؟

لەبەر ئەوە، بە نموونەیەك ئاماژە بۆ ئەم حیكمەتە دەكەین و دەڵێین:

وەستایەكی كارامە – بۆ نموونە وەك بەرگدروویەك – برێك پارە خەرج دەكات و ماندوو دەبێت و هونەر و كارامەیی‌یەكەی خۆی دەخاتەكار تاكو شتێكی جوانی تایبەت بە سنعەتەكەی خۆی دروست بكات و بیكات بە نموونە(مۆدێل)ی سنعەت و دروستكراوەكانی، چونكە پاشان دەتوانێت – بێ مەسرەف و ئەرك و بە خێرایی‌یەكی تەواو – هاووێنەی ئەو سنعەتەی یەكەم جاری دروست بكات، تەنانەت هەندێ جار ئەم كارەی هێندە بەلاوە ئاسان دەبێت دەڵێی ئەم تەنها فەرمان دەردەكات و كارەكەش لە خۆی‌دا ئەنجام دەدرێت! چونكە كارەكەی رێكوپێكی و بەردەوامی‌یەكی وردی چەشنی كاری كاتژمێری بەدەست هێناوە، وەك بڵێی كارەكە تەنها بە فەرمان بۆ دەركردن ئەنجام دەدرێت..

كارسازی دانا و وێنەكێشی زانایش – ولله المثل الأعلى – بە رێسایەكی "قەدەری"ی وەك نموونەی ئەو شتە، كۆشكی جیهان و هەموو شتانی ناوی داهێناوە و، پاشان ئەندازەیەكی

دیاری کراوی بە هەموو شتانی ناو کۆشك بەخشیوە، چ هەندەکی بن یان هەمەکی.. "جوزء" بن یان "کول".

خۆ ئەگەر سەرنج لە کارەکانی ئەم خواوەندە وێنەکێشە ئەزەلیە بدەیت، دەبینیت: هەموو "چەرخ"ێك دەکات بە نموونە(مۆدێل)ێکی ئەوتۆ کە جیهانێکی نوێ و ناوازە و ناسکی ئەوتۆی دەکاتە بەر بە موعجیزاتی توانستی خۆی ڕازێنراونەتەوە و.. هەموو "ساڵ"ێکیش دەکات بە پێوانەیەك کە بە کارە دەراساکانی میهرەبانیی خۆی چەندین بوونەوەری نوێی بە بەر دەچنێت و.. هەموو "ڕۆژ"ێکیش دەکات بە دێڕێکی ئەوتۆ کە چەندین بوونەوەری ناوازە و نوێی وایان تێدا دەنووسێت کە بە وردەکاریی حیکمەتی خۆی ڕازێنراونەتەوە.. هەر ئەم خاوەن توانستە ڕەهایەی کە هەموو چەرخ و ساڵ و ڕۆژێکی کرد بە نموونە و شتانی بە بەر برین، گۆی زەویش، تەنانەت هەموو چیا و بیابانێك و گشت باخ و بێستان و درەخت و گوڵێکیشی کردووە بە نموونە و گەلێ بوونەوەری تازە و پاراوی هاوشانی یەکتری لەسەر زەویدا دروست کردووە، بەم چەشنە دنیایەکی نوێ بەدی دەهێنێت و، دوای ئەوەی جیهانی پێشووی لە بەرچاودا لابرد جیهانێکی تری ڕێکوپێك و نوێ دەهێنێتە گۆڕێ.

بەم جۆرە، خوای گەورە لە هەموو وەرزێکدا گەلێ موعجیزەی نوێ لەسەر توانستی ڕەهای خۆی پێشچاو دەخات و، لە هەموو باخ و بێستانێکدا دیارییە تازەکانی میهرەبانیی خۆی ئاشکرا دەکات و، کتێبێکی نوێی حیکمەت دەنووسێت و، سەرلە نوێ خانەیەك بۆ پێگەیاندن و ئامادەکردنی میهرەبانییەکەی دادەمەزرێنێت و، پۆشاکێکی ناوازەی نوێ لەبەر بوونەوەران دەکات و، لە هەموو بەهارێکدا بەرگێکی نوێی ڕەنگین دەکاتە بەر هەموو درەختێك و، بە چەندین ئارایشتکاریی نوێ و درەخشانی چەشنی ئەستێرە درەوشاوەکان دەیڕازێنێتەوە و دەستەکانی لە دیارییەکانی میهرەبانی پڕ دەکات.

ئەو کەسەی کە بەوپەڕی وردەکاری و کەماڵی ڕێکوپێکی ئەم کارانە جێبەجێ دەکات و، ئەم جیهانە گەڕۆکانەش کە بەسەر تەنافی زەماندا هەڵخراون دەگۆڕێت و بەوپەڕی دانایی و چاودێری و توانست و وردەکاری بە دوای یەکدا دەیانهێنێت..

بێ گومان ئەو کەسە، خاوەنی توانستێکی ڕەها و دانستێکی ڕەها و بینین و زانستێکی ڕەهایە و، هەرگیز ناگونجێ هیچ کارێکی بە "ڕێکەوت" لە دەست ڕوو بدات.. ئەو کەسە، ئەو بەدیهێنەرە مەزنەیە کە دەفەرموێ: ﴿**إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ**﴾(یس:٨٢) و ﴿**وَما أَمرُ السَّاعَةِ إِلاَّ كَلَمْحِ البصَرِ أَو هُوَ أَقْرَب**﴾ (النحل: ٧٧). بەم جۆرە،

توانستی ڕەهای خۆی دەردەخات و ڕوونی دەكاتەوە كە حەشر و قیامەت سەبارەت بەو توانستەوە لەوپەڕی ئاسانیدایە، سەرجەمی شتانیش ژێربار و ملكەچی تەواوەتیی فەرمانەكانی ئەون و، شتانیش - بە بێ دەست تێوەردان و كار تێدا كردن - یەكسەری و ڕاستەوخۆ بەدی دەهێنێت. قورئانی پیرۆز، بۆ ئەوەی ئاسانیی ڕەها لە بەدیهێنانی شتاندا دەربخات، دەری دەبڕێت كە خوای گەورە تەنها بە فەرمان دەركردن هەر شتێكی بوێت بەدیی دەهێنێت و ئەنجامی دەدات.

*بە كورتی:*

هەندێ لە ئایەتە پیرۆزەكانی قورئان ئەوپەڕی وردەكاری و دانایی لە بەدیهێنانی شتاندا ڕادەگەیەنێت، بە تایبەت لە سەرەتای بەدیهێناندا.. بەشێكی تری ئایەتەكان ئاسانیی ڕەها و خێرایی ڕەها و ئەوپەڕی ملكەچی و بێ ئەركی لە بەدیهێنانی شتاندا دەردەخات، بە تایبەت لە دووپات بوونەوە و سەرلەنوێ بەدیهێنانەوەی ئەو شتانەدا.

○ **تیشكی سێهەم:**

ئەی نەفسی گرفتاربووی وەسوەسەم! ئەی ئەو دەروونەی كە سنووری خۆتت شكاندووە!

تۆ دەڵێی: ئایەتی: ﴿**ما مِنْ دابَّةٍ إِلاّ هُوَ آخِذٌ بِناصِيَتِها**﴾ (هود:٥٦) هەروەها ئایەتی: ﴿**بِيَدِهِ مَلَكوتُ كُلِّ شَيءٍ**﴾ (یس:٨٣) هەروەها ئایەتی: ﴿**وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ**﴾ (ق:١٦) ئەم ئایەتە مەزنانە، ئەوپەڕی نزیكایەتیی خوای گەورە دەردەخەن.. كەچی چەندین ئایەتی تری وەك: ﴿**وَإِلَيْهِ تُرْجَعونَ**﴾ (یس:٨٣) هەروەها: ﴿**تَعْرُجُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ في يَوْمٍ كانَ مِقْدارُهُ خَمسينَ أَلْفَ سَنَةٍ**﴾ (المعارج:٤) هەروەها ئەو وتەیەی پێغەمبەریش ﷺ كە لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە: "... سَبعين ألف حِجاب "[1] هەروەها ڕاستیی میعراج..

هەموو ئەمانە، ئەوپەڕی دووریی ئێمە لە خوای گەورەوە، دەردەخەن..

دەمەوێ ئەم نهێنییە تەماوییەم بە جۆرێكی وا بۆ ڕوون بكەیتەوە كە لە زەینەكانەوە نزیك بخرێتەوە!

**وەڵام:** مادەم وایە، ئەوا گوێ ڕابگرە:

(١) حديث: (دون الله تبارك و تعالى سبعون ألف حجاب من نور وظلمة). رواه الأصبهاني في كتاب (العظمة) عن سهل بن سعد. ضعفه البوصيري والحافظ ابن حجر العسقلاني. بڕوانە پەراوێزی: (المطالب العالية للحافظ ابن حجر) الطبعة المحققة من قبل غنيم عباس وياسر إبراهيم. ٣٠١/٣ و ٤٩/٤

(وەرگێڕ)

**یەکەم:** لــە کۆتـایی تیشـکی یەکـەمدا وتمـان کـە: "خـۆر" بـەهۆی ڕووناکییـە نەبەسـتراوە سەربەستەکەی و لـە ڕووی دەرکـەوتنی وێنـە ناماددییەکـەی لـە ئاوێنـەکاندا، لــە بیلبیلــەی چاوت – کە ئاوێنەی پەنجەرەی گیانی تۆیە – نزیکترە لێتەوە، کـەچی تابڵـێی تـۆ لـە خـۆرەوە دووریت! چونکە لەناو ماددەدا پابەندیت و بەستراویتەوە و، مەگەر هـەندێك وێنـەی خـۆر لـە ناو ئاوێنەکاندا و چـەند سێبەرێکی، دەنـا نـاتوانیت دەستی لـێ بدەیـت و، مەگـەر جۆرێکـی درەوشـانەوەی هـەندەکیی خـۆر دەنـا نـاتوانیت ڕووبـەڕووی ڕابوەسـتیت و، مەگـەر لــە ڕەنگەکانی کە لە حوکمی سیفەتەکانیدان و، هـەندێك لـە تیشـکەکانی کـە وەك بەشێك لـە ناوەکانی "خۆر" وان، دەنا ناتوانیت نزیکی ببیتەوە و توخنی بکەویت..

خۆ ئەگـەر بتـەوێت لـە پلـەی ڕاسـتەقینەی خـودی خـۆر نزیـك ببیتـەوە و ڕووبـەڕووی ڕابوەستیت، دەبێ لـە زۆر پابـەندی و کـۆت و زنجیری ئێستات خـۆت داماڵیت و بە چـەند پلەیەکی هەمەکیی زۆر و زەبەندەدا تێپەڕ ببیت، وەك بڵـێی لـە ڕووی دەستبەرداربوونتەوە لـە پابەندییە ماددییەکانت لە ناوەرۆکدا بە ئەندازەی گۆی زەوی گەورە ببیت و ڕۆحیشت بە چەشنی هەوا بڵاو ببێتەوە و بە ئەندازەی مانگیش بەرز ببیتەوە و، بە وێنـەی مـانگی چـواردەش ڕووبەڕووی خۆر ڕابووەستی، ئنجا دەتوانیت لافی جـۆرە نزیـك بوونەوەیـەك لـە خـۆر لـێ بدەیت.

خوای گەورەش (ولله المثل الأعلـی) کـە مـەزنی خـاوەن کـەماڵ و شـکۆمەند و، "واجـب الوجـود" و، بەدیهێنـەری هـەموو بەدیهاتوویـەك و، نـووری هەمیشـەیی و، پادشـای ئـەزەل و ئەبەدە.. لە نەفسی خۆت نزیکترە لێتەوە، کەچی تۆ بە چەشنێکی ڕەها دووریت لێیەوە.

ئەگـەر هـێز و توانـای هـەڵێنجان(الإسـتنباط) لــە خۆتــدا شـك دەبـەیت، ئــەوا وردەکارییەکانی ناو نموونەکە بەسەر ڕاستییەکاندا تەتبیق بکە.

**دووهەم:** بۆ نموونـە: نـاوی "سـەرکردە" – لـە نێـوان نـاوە زۆرەکـانی پادشـادا – لـە چـەند فەرمانگەیەکی یەك لەناو یـەکی دەوڵەتەکـەیدا دەردەکـەوێت، هـەر لـە فـەرماندەیی گشـتیی سـەرکردەی سوپا و فەرمانگـەی موشـیر و فەریقـەوە تـا دەگاتـە فەرمانگـە و بازنـەی مـلازم و عەریف. واتە لە چەندین فەرمانگەی فراوان و تەسکدا و بە شێوەیەکی هەمـەکی و هـەندەکی ئەو ناوەی پادشا دەردەکەوێت..

واتە سەرباز لە کاتی ئەنجامدانی خزمەتی سەربازیدا پلە و پایەی عەریفەکەی دەکـات بـە مەرجـەعێکی خـۆی، چونکـە دەرکـەوتنی یـەکجار هـەندەکیی "سـەرکردەیی" لـەو مەقامــەدا دەبینێت و، لە ڕێی ئەم دەرکەوتنـە هەندەکییـەی نـاوی سـەرکردە لـە مـەقامی عەریفەکـەیدا

په‌یوه‌ندیی به سه‌ركرده هه‌ره گه‌وره كه‌یه‌وه بۆ دروست ده‌بێت. به‌ڵام گه‌ر ئه‌و سه‌ربازه بیه‌وێت له ڕێی ناونیشانی ئه‌سڵیی سه‌ركرده‌ی هه‌ره گه‌وره‌ی سوپا په‌یوه‌ندیی پێوه بكات، ده‌بێ چه‌ند پله‌یه‌ك ببڕێت و پێیاندا سه‌ربكه‌وێت، هه‌ر له پله‌ی عه‌ریفه‌وه تا پله‌ی هه‌مه‌كیی سه‌ركرده‌ی گشتی.

واته پادشا به ناوه‌كه‌ی و فه‌رمانڕه‌وایی و یاسا و زانیاری و ته‌له‌فۆن و كارسازیی خۆی، له‌و سه‌ربازه‌وه نزیكه، خۆ ئه‌گه‌ر پادشا مرۆڤێكی نوورانی و له چینی "ئه‌بدال"ی ئه‌ولیاكان بێت، ئه‌وا به ئاماده‌بوونی زاتیشی له‌و سه‌ربازه‌وه نزیك ده‌بێت، چونكه ئه‌و كاته هیچ شتێك ڕێی لێ ناگرێت. واته ئه‌و سه‌ربازه هه‌رچه‌ند له‌وپه‌ڕی دووری‌دایه له پادشا و هه‌زاران پله‌و په‌رده هه‌ن له نێوان خۆی و پادشادا، كه‌چی هه‌ندێ جار پادشا به‌زه‌یی پێدا دێته‌وه و - دوور له عاده‌تی خۆی - ده‌یباته دیوانی حوزووری خۆی و له‌وێ‌دا له چاكه‌كاری و لوتفی خۆی به سه‌ردا په‌خش ده‌كات.

(ولله المثل الأعلى) ئه‌و خواوه‌نده‌ش كه خاوه‌نی فه‌رمانی "كن فیكون"ه و به وێنه‌ی سه‌ربازی گوێڕایه‌ڵ: خۆر و ئه‌ستێره‌كانی ملكه‌چی فه‌رمانه‌كانی خۆی كردووه، زیاد له هه‌موو شتێك له هه‌موو شتێكه‌وه نزیكتره، كه‌چی هه‌موو شتێك به چه‌شنێكی بێ سنوور و له‌ڕاده‌به‌ده‌ر له‌و خواوه‌نده‌وه دووره..

خۆ ئه‌گه‌ر مرۆڤ بیه‌وێت بێ په‌رده بڕواته ناو دیوانی حوزووری موقه‌دده‌سی ئه‌و، ئه‌وا ده‌بێ حه‌فتا هه‌زار په‌رده‌ی نوورانی و تاریك (واته ماددی و گه‌ردوونی و ئه‌سمائی و سیفاتی) ببڕێت و، پاشان به‌ره‌و هه‌موو یه‌كێك له‌و ناوانه سه‌ر بكه‌وێت كه هه‌ریه‌كه‌یان دارای هه‌زاران پله‌ی دره‌وشانه‌وه‌ی تایبه‌تی و هه‌مه‌كین و، ده‌بێ به‌ره‌و چینه‌كانی سیفه‌ته به‌رز و مه‌زنه‌كانی خواوه‌ند بڕوات و، ئنجا بۆ عه‌رشی ئه‌عزه‌می ئه‌و سه‌ر بكه‌وێت كه به لێدره‌وشانه‌وه‌ی ئیسمی ئه‌عزه‌م به‌هره‌وه‌ر بووه. خۆ ئه‌گه‌ر ڕاكێشان و لوتفی خوای گه‌وره بۆ ئه‌م مه‌به‌سته نه‌كه‌وێته‌كار، ئه‌وا پێویست به هه‌زاران ساڵ و كار و ڕێگابڕین ده‌كات.

بۆ نموونه: ئه‌گه‌ر بته‌وێت له ڕێی ناوی "الخالق"ه‌وه له خوای گه‌وره نزیك ببیته‌وه، ده‌بێ پێش هه‌موو شتێك له‌و ڕووه‌وه په‌یوه‌ندیی له‌گه‌ڵدا ببه‌ستیت كه به‌دیهێنه‌ری خۆته.. ئنجا كه به‌دیهێنه‌ری سه‌رجه‌می خه‌ڵكی‌یه.. پاشان به‌و ناونیشانه‌ی كه به‌دیهێنه‌ری هه‌موو زینده‌وه‌رانه.. ئنجا به ناوی ئه‌وه‌ی كه به‌دیهێنه‌ری گشت بوونه‌وه‌رانه. له‌به‌ر ئه‌وه، گه‌ر به‌م چه‌شنه پله به پله و هه‌نگاو به هه‌نگاو نه‌ڕۆیت، هه‌ر له سێبه‌ردا ده‌مێنیته‌وه و له دره‌وشانه‌وه‌یه‌كی هه‌نده‌كی زیاتر ده‌ست ناكه‌وێت.

**بێدارکردنەوەیەك:**

لە نموونەکەی پێشەوەدا، پادشا ناوبراوەکە لەبەر ئەوەی خۆی نەیدەتوانی ڕاستەوخۆ کارەکانی ڕاپەڕێنێت ناچار لە ناوەندی پلەکانی ناوی "سەرکردە"دا چەند هۆکارێکی وەك موشیر و فەریقی دانابوو.. بەڵام ئەو خواوەندەی کە هێندە بەتوانایە جڵەوی هەموو شتێکی لە دەستدایە، پێویستی بە هۆکارەکان نییە، بەڵکو هۆکارەکان چەند شتێکی ڕواڵەتیی ڕووتن، پەردەی ڕووی عیززەت و مەزنایەتیی ئەون و چەند بەڵگەیەکن لە ڕێی: بەندایەتی و کۆڵەواری و هەژاری و سەرسامی‌یان لە بەردەم مەزنێتیی خوای گەورەدا، ئاماژە بۆ پادشایی پەروەردگاریێتیی ئەو دەکەن و، ئەوان یارمەتی‌دەری خوای گەورە نین و هەرگیز هۆکارەکان ناتوانن ببن بە هاوبەش لە دەستەڵاتداریی پەروەردگاریێتیی ئەودا، چونکە ئەو هۆکارانە تەنها بریتین لە چەند پەردەیەك کە بۆ بینین پێش‌چاو خراون.

○ **تیشکی چوارەم:**

ئەی نەفسی تەمبەڵم!

ڕاستیی نوێژ، کە لە میعراجی ئیماندار دەچێت، وەك ئەوە وایە سەربازێکی ئاسایی – بە وێنەی نموونەکەی پێشوو – تەنها بە هۆی لوتفی پادشاوە لە کۆڕی مەزنی پادشادا وەربگیرێت..

جا وەرگرتنی تۆش بۆ ئامادەبوون لە بەردەم شکۆمەندیی خوای گەورەدا، تەنها ئاوڕ لێدانەوەیەکی لوتفی خواوەندی مەزنی خاوەن جوانی و پەرستراوی شکۆمەندە. چونکە کاتێك کە تۆ دەڵێی: "اللّٰه أکبر" لە واتا و ناوەرۆکدا بەرەوپێش دەڕۆیت و، چ بە ئەندێشە و چ بە نییەت دنیا و قیامەت دەبڕیت و تەنانەت لە پابەندی‌یە ماددی‌یەکان خۆت دادەماڵیت و بەرز دەبیتەوە و پلەیەکی بەندایەتیی هەمەکی یان سێبەرێکی پلەی هەمەکی یان یەکێ لە وێنەکانی، بەدەست دەهێنیت و، بە جۆرە حوزوورێکی قەلبی و ئامادەبوون لە بەردەستی خوای گەورەدا شەرەفمەند دەبیت و، بە گفتوگۆی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ بەهرەیەکی مەزن دەستی خۆت دەخەیت، هەرکەس بەپێی پلەی خۆی.

بەڵێ ڕاستە، وشەی: "اللّٰه أکبر.. اللّٰه أکبر" و دووپات بوونەوەی لە جموجوڵەکانی نوێژدا ئاماژەیە بۆ بڕینی پلەکان و سەرکەوتن بەرەو بەرزیی مەعنەوی و لە بازنە جوزئی‌یەکانەوە بۆ هەمەکی‌یەکان. ئەم وشەیە ناونیشانێکە بۆ پوختەی کەماڵاتی گەورەیی خواوەند کە لە چوارچێوەی ناسین و شارەزایی ئێمەدا نین، وەك بڵێی هەموو وشەیەکی "اللّٰه أکبر" ئاماژەیەك بێت بۆ بڕینی یەکێك لە پلەکانی میعراج.

بەم جۆرە، گەیشتنی مرۆڤ بە سێبەرێك یان تیشكێكی حەقیقەتی ئەم نوێژە، چ لە مەعنادا و چ بە نییەت و چ بە تەسەوور و چ بە ئەندێشە، نیعمەتێكی یەكجار مەزن و بەختەوەرییەكی تەواو گەورەیە.

لەبەر ئەمەیە كە لە حەجدا بە زۆری زیكری: "الله أكبر" دووپات دەكرێتەوە، چونكە حەج عیبادەتێكە لە پلەیەكی هەمەكیدا بە ڕاستەوخۆ و ئەصالەت بۆ هەموو حاجییەك.

هەروەك سەربازی ئاسایی لە ڕۆژی تایبەتیی وەك جەژندا - كتومت وەك فەریق - ڕاستەوخۆ دەڕواتە حوزووری پادشا و لە لوتف و بەخشندەیی ئەو بەهرەمەند دەبێت، حاجییش - هەرچەندەش عەوام بێت - لە حەجدا بە وێنەی ئەو وەلییەی كە پلەكانی بڕیوە، بە ناونیشانی "رب العالمين" ڕوو لە پەروەردگاری مەزنی دەكات و شەرەفمەندی ئەنجامدانی بەندایەتییەكی هەمەكی دەبێت.

بێ گومان ئەو پلە هەمەكییانەی پەروەردگاریتی، كە بە كلیلی حەج دەكرێنەوە و.. ئاسۆكانی مەزنایەتیی خوایەتی كە بە چاویلكەی حەج دەبینرێن و.. بازنەكانی بەندایەتی كە لە دڵ و ئەندێشەی حاجیدا فراوان دەبن كاتێ مەناسیكی حەج ئەنجام دەدات و.. پلەكانی گەورەیی و مەزنێتیی خواوەند و ئاسۆكانی درەوشانەوەكان، كە لە بەردەم مەزنێتیی خوایەتی و سام و شكۆی پەروەردگارێتیدا گەرموگوڕی و شەوق و سەرسامی و سەرسووڕمان بە حاجی دەبەخشن.. هەموو ئەمانە، تەنها بە "الله أكبر.. الله أكبر" نەبێت دانامركێن و، تەنها بە دووپاتكردنەوەی ئەم زیكرە دەتوانرێت پلە دەركەوتووە بینراوەكە یان تەسەووركراوەكە ڕابگەیەنرێت و ئاشكرا بكرێت.

ئەم واتایە - دوای حەج - بە چەند پلەیەكی بەرز و هەمەكی و جیا جیا، لە نوێژی جەژن و نوێژەبارانە و نوێژی مانگ گیران و ڕۆژ گیران و نوێژی جەماعەتدا، دەردەكەون.

ئالێرەوە گرنگیی شەعائیرەكانی ئیسلاممان بۆ دەردەكەوێت، با لە جۆری سوننەتەكانیش بن.

سبحان مَنْ جعل خزائنه بين الكاف والنون.

﴿**فَسُبْحَانَ الَّذي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شيءٍ وَإلَيْهِ تُرْجَعُونَ**﴾.

﴿**سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنْتَ الْعَليمُ الْحَكيمُ**﴾.

﴿**رَبَّنَا لا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إذْ هَدَيْتَنا وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إنَّكَ أنْتَ الْوَهَّابُ**﴾.

وصل وسلم على رسولك الأكرم، مظهر اسمك الأعظم، وعلى آله وأصحابه وإخوانه وأتباعه. آمين يا أرحم الراحمين.

## پاشکۆیەکی بچووک

خوای گەورەی بەتوانای زانای کردگاری دانا، بە: "ڕێسا" و "لەگەڵ یەك گونجان"ی بەدیهاتووانی، کە ئەمانەش ئەو عادەتانەی خواوەند دەریاندەخەن کە لە شێوەی چەند یاسایەکی گەردوونی‌دان، توانست و حیکمەتی خۆی و دەست تێوەرنەدانی "ڕێکەوت" لە هیچ کارێکی‌دا، دەردەخات..

هەروەها بەو کارانەی کە نامۆ و شازی ناو یاسا گەردوونی‌یەکانن و پێچەوانەی کارە ئاسایی‌یەکانی ئەون و.. بە گۆڕانکاری‌یە ڕواڵەتی‌یەکان و.. بە جۆراوجۆریی شتە دەستنیشان کراوەکان و.. بە ئاڵوگۆڕ بوونی زەمانی نەمان و پەیدابوون..

بە هەموو ئەمانە، ویستی خۆی دەردەخات و دەیچەسپێنێت کە: هەر خۆی بکەری خاوەن ئیختیارە و، ویست و ئیختیاریشی ملکەچی هیچ پابەندی و کۆت و زنجیرێك نی‌یە و ئەم کارەش پەردەی "رۆتین" دەدرێت و خاوەن هەستان تێ‌دەگەیەنێت کە: هەموو شتێك، هەموو کاتێك، لە هەموو کاروبارێکی‌دا، لە هەر شتێکدا پەیوەندیی بە خۆیەوە هەبێت، موحتاجی خوایە و ملکەچی پەروەردگاریتی‌یەکەیەتی. بەمەش بێ ئاگایی ناهێڵێت و سەرنجی جیننی و ئادەمیزاد لە هۆکارەکانەوە بۆ لای هۆسازێنەری هۆکارەکان ڕادەکێشێت.

ڕوونکردنەوەکانی قورئانی پیرۆز لەسەر ئەم بناغەیە ڕوو لە خەڵکی دەکەن.

بۆ نموونە:

لە زۆربەی شوێنەکاندا هەندێ جار ڕوو دەدات کە بەشێك لە درەختە بەردارەکان ساڵێك بەر دەگرن، واتە لە گەنجینەی میهرەبانی‌یەوە بەری دەدرێتێ و ئەویش تەسلیمی ئێمەی دەکات.. بەڵام ساڵەکەی تر سەرەڕای بوونی هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکانی بەرگرتن بەردەگرێت، بەڵام نایبەخشێت!

نموونەیەکی تر:

کاتەکانی باران بارین - بە پێچەوانەی کارە پێویستەکانی تر - هەمیشە ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت و ناتوانرێت دەستنیشان بکرێن، تەنانەت لە ناوەندی پێنج شتە غەیبی‌یەکاندا

دانراون. چونكه گرنگترین جێگا له بوونه‌وه‌ردا بۆ "ژیـان" و "میـهره‌بانی" دانـراوه‌. بـارانیش مایه‌ی سه‌رهه‌ڵدانی "ژیان" و "میهره‌بانی"ی بێ گـه‌رده‌.. له‌بـه‌ر ئـه‌وه‌، ئه‌و ئـاوه‌ی كـه مایـه‌ی ژیانه و میهره‌بانی‌یه‌كی به‌خشراوه‌، ناڕواته ناوه‌ندی قاعیده و ده‌ستوورێكی بـه‌رده‌وامی ئـه‌وتۆ كه ببێت به په‌رده له نێوان به‌نده و خوای گه‌وره‌دا و بێ ئاگایی بـۆ مـرۆڤ فه‌راهـه‌م بـهێنێت، به‌ڵكو ڕاسته‌وخۆ و بێ په‌رده له‌ناو ده‌ستی خواوه‌ندی شكۆمه‌ند و نیعمه‌تده‌ر و ژیـان به‌خشـی میهره‌باندا ده‌بێت تاكو هه‌میشه و به‌رده‌وام ده‌رگاكانی دوعا و شـوكرانه‌بژێری لـه‌سـه‌ر پشـت بن.

نموونه‌یه‌كی تر:

به‌خشینی ڕۆزی و ده‌ستنیشـان كردنی سه‌روسیما و ڕوخسـار و شـێوه‌ی مـرۆڤ ته‌نـها چاكه و به‌خششێكی خوایی‌یه به جۆرێك پێی ده‌به‌خشێت كه له حسابی مرۆڤه‌كـه‌دا نـه‌بووه‌، ئه‌مـه‌ش بـه ئاشـكرا سه‌ربه‌سـتی و ڕه‌هـایی ویســتی خواوه‌نـد و ئیختیـاری پـه‌روه‌ردگار ده‌رده‌خات.

به‌رێخستنی با و، ژێربارخستنی هه‌ور و، كاروباره خوایی‌یه‌كانی تری وه‌ك ئه‌مانه‌، لـه‌سـه‌ر نموونه‌كانی پێشوو قیاس بكه‌.

# وتەی حەڤدەهەم

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلى الأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً ۞ وَإِنَّا لَجاعِلُونَ ما عَلَيْها صَعِيداً جُرُزاً﴾ (الكهف: ٧-٨)

﴿وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاّ لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾ (الأنعام:٣٢)

(ئەم وتەیە بریتی‌یە لە دوو مەقامی بڵند و پاشکۆیەکی درەخشان)

## مەقامی یەکەم

بەدیهێنەری میهرەبان و ڕۆزیدەری بەخشندە و سنعەتکاری دانا ئەم دنیایەی لە شێوەی جەژنێکی شاد و ئاهەنگێکی بەسام و شکۆ و فیستیڤاڵێکی مەزندا بۆ جیهانی "گیان"ەکان و ڕۆحانییات داناوە و، بە ئاسەوارە ناوازەکانی ناوە جوانەکانی خۆیشی ئارایشتی داوە و، جەستەیەکی لەبار و شیاویشی بە قەد باڵای هەموو ڕۆحێکی چ بچووك و چ گەورە و چ بەرز و چ نزم پۆشیوە. ئنجا هەست و شعوور و هەموو ئەو شتانەشی پێ بەخشیوە کە پێویستی پێیان دەبێت بۆ سوودوەرگرتن لەو نیعمەتە جۆراوجۆرە لەژمارەبەدەرانەی کە لەو جەژنە شاد و ڕەنگینەدا بڵاو کراونەتەوە و لەو فیستیڤاڵە مەزنەشدا پێش‌چاو خراون..

هەروەها ئەو بەدیهێنەرە میهرەبانە "بوون"ێکی بەرجەستەی "ماددی"ی بە هەموو یەکێ لەو گیانانە بەخشیوە و، تەنها بۆ یەك جار بۆ لای ئەو جەژن و فیستیڤاڵەی ناردووە و، پاشان ئەو جەژنە (بە کات و شوێن یەکجار فراوانە)ی بەسەر چەند ڕۆژ و بەشەکانی یەك ڕۆژدا دابەش کردووە و، بەم پێیە هەموو چەرخ و ساڵ و وەرز و ڕۆژ و هەموو بەشێکی ڕۆژی کردووە بە فیستیڤاڵێکی خۆش و بەرز و جەژنێکی شاد و بڵند و نمایشێکی گشتی بۆ کۆمەڵ و دەستەیەك لە بەدیهاتووە گیانلەبەرەکان و دروستکراوە ڕووەکی‌یەکانی خۆی، بە تایبەت ڕووی زەوی و بە تایبەت‌تریش لە وەرزی بەهار و هاویندا.

بەم جۆرە، ئەو بەدیهێنەرە میهرەبانە، چەندین جەژنی یەك لە دوای یەك بۆ سەرجەم تاقم و جۆرەکانی بەدیهاتووە تەواو بچووکەکانی خۆی دەهێنێتەکایەوە، بە ڕادەیەك جوانی و قەشەنگیی ئەو جەژنە سەرنجی ڕۆحانییەکانی ناو چینە بەرزەکان و مەلائیکەتان و ئەهلی ئاسمانەکان بۆ بینینی ڕادەکێشێت و، ڕوانینی بیریارانیش بە چێژێکی هێندە بلند کە ژێری لە پەی پێ‌بردنیدا دەستەوسانە، بۆ موتالاکردنی کەمەندکێش دەکات.. کەچی ئەم میوانداریی‌یە خوایی و جەژنە پەروەردگاری‌یە و ئەو درەوشانەوەیەی ناوی "الرحمن و المحیي" کە تیایاندا دەردەکەوێت ئاوێتەی مردن و جودایی دەبن، چونکە ناوی "القهار و الممیت"ی خوای گەورەیان لە بەردەمدا ڕاست دەبێتەوە! ئەمەش بە ڕواڵەت لەوانەیە لەگەڵ هەمەلایەنیی ئەو میهرەبانی‌یەی خوای گەورەدا یەك نەگرێتەوە کە لەم ئایەتەدا باس کراوە:

﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ (الأعراف:١٥٦).

بەڵام لە ڕاستی‌دا چەندین لایەنی زۆر هەن کە گونجاوی و پڕاوپڕیی ئەم کارەیان لەگەڵ میهرەبانیی خواوەندا تێدا دەردەکەوێت، وا لێرەدا تەنها یەك لایەنیان لە خوارەوەدا باس دەکەین:

پاش تەواوبوونی نمایشە پەروەردگاری‌یەکانی یەك بە یەکی ئەو دەستە و تاقمانە و هاتنەدیی ئەو ئەنجامانەی کە لەو نمایشەدا جێی مەبەستن، بەدیهێنەری میهرەبان و بەخشندە، لە ڕووی میهرەبانی‌یەوە، تاسە و ئارەزووی حەوانەوە بە هەموو یەکێ لەو کۆمەڵ و تاقمانە دەبەخشێت و مەیلی گواستنەوەیان بۆ جیهانێکی تر دەداتێ و بە چەند شێوەیەکی بێزاری و نەفرەت، لە دنیا بێزاریان دەکات.

خۆ کاتێکیش کە دەستیان لە ئەرکی ژیان پێ هەڵدەگرێت و، لە کارمەندی‌یەکانی ئەستۆیان دەرباز دەکرێن و، مۆڵەت دەدرێن، بەدیهێنەری میهرەبان تاسەمەندی و ئارەزوویەکی بەتین بۆ ڕۆیشتن بەرەو نیشتمانی ڕاستەقینە، بە گیانی ئەوان دەبەخشێت..

هەروەك خوای گەورە پلەی شەهیدی بەو سەربازە دەبەخشێت کە لە پێناوی خزمەتگوزاری و ئەرکی جیهاددا مردبێت و.. هەروەك ئەو مەڕەی لە دنیادا کراوە بە "قوربانی" لە دواڕۆژدا بوونێکی ماددیی پێ دەبەخشێت و پاداشتی دەداتەوە و وەك بوراق خاوەنەکەی بەسەر پردی سیراتدا دەپەڕێنێتەوە..

لە میهرەبانیی ئەو خواوەندە بەخشندە میهرەبانەوە هەرگیز بە دوور نازانرێت کە لە گەنجینەی میهرەبانیی فراوانی خۆیەوە پاداشتێکی ڕۆحانی و مەعنەویی ئەوتۆ بەو

گیانلەبەر و زیندەوەرانەش ببەخشێت کە لەگەڵ توانا و لێهاتنی ئەواندا بگونجێت، پاش ئەوەی کە لە دنیادا گیرۆدەی گەلێ گیروگرفت بوون و، لە دەمی ئەنجامدانی کارمەندییە سروشتییە تایبەتییەکانیاندا تیاچوون کە پەروەردگار خستبوویە ئەستۆیانەوە و، لە کاتی گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خواوەنددا گەلێ ماندووبوونیان هاتەڕێ. ئەمەش بۆ ئەوەی کە لە دەمی بەجێهێشتنی دنیادا ئازاری سەخت نەچێژن و پڕ بە دڵ لەو چارەنووسە ڕازی و دڵنیا بن. ولا یعلمُ الغیبَ إلاّ الله.

بەڵام مرۆڤ کە بەڕێزترینی گیانلەبەرانە و، لە ڕووی چەندایەتی و چۆنێتیشەوە لە هەموو زیندەوەران زیاتر سوود لەم جەژنە وەردەگرێت، بە سۆز و میهرەبانیی خوای گەورە، حاڵەتێکی شەوق و تاسەی ڕۆحیی پێ دەبەخشرێت کە لەم دنیایەی پێوەی گیرۆدە بووە بێزاری دەکات، تاکو بە ئاسایش و دڵنیایی و ئارامی بەرەو ئەودنیا بپەڕێتەوە. ئنجا ئەو ئادەمیزادەی کە مرۆڤایەتییەکەی نوقمی گومڕایی نەبووبێت، سوود لەو حاڵەتە ڕۆحییە وەردەگرێت و بە دڵێکی پڕ لە دڵنیایی ئیمان لە دنیا کۆچ دەکات.

وا بۆ نموونە پێنج دانە لەو ڕووانە باس دەکەین کە ئەو حاڵەتە ڕۆحییە بۆ مرۆڤ فەراهەم دەهێنن:

**ڕووی یەکەم:** لەگەڵ سەرهەڵدانی پیریی مرۆڤدا بەدیهێنەری میهرەبان مۆری تیاچوون و نەمان بەسەر ڕوخساری شتانی دنیایی سەرنج بزوێن و لەخشتەبەردا پیشانی ئادەمیزاد دەدات و، واتا و ناوەڕۆکە تاڵەکانی ئەو شتانەی تێ دەگەیەنێت. ئەمەش وا لە مرۆڤ دەکات کە دنیای لە بەرچاودا ببێزرێت و لە بریی ئەم شتە فانی و لەناوچووانە، بە پەلە بە دوای شتانی باقی و هەمیشەییدا بگەڕێت.

**ڕووی دووهەم:** خوای گەورە، تاسە و نیاز لە هەست و نەستی مرۆڤدا دادەنێت بۆ کۆچ کردن بەرەو ئەو جێیەی کە لە سەدا نەوەدونۆی خۆشەویستانی هاوپەیوەندی و هاوڕێی کۆچیان بۆ کردووە و لە جیهانێکی تردا نیشتەجێ بوون. ئەم خۆشەویستییە گەرموگوڕە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت کە بە خۆشی و شادمانی پێشوازی لە مردن بکات.

**ڕووی سێهەم:** بەدیهێنەری میهرەبان، چ لە ڕێی قورسیی باری ژیان و چ لە ڕێی ئەرکەکانی گوزەرانی ئەم دنیایە و لە ڕێی چەندین شتی ترەوە، مرۆڤ دەخاتە دۆخێکی وەهاوە کە هەست بە لاوازی و دەستەوسانیی نەبڕاوەی خۆی بکات. بەمەش ئارەزوویەکی بەتینی تێدا پەیدا دەکات بۆ پشوودان و حەوانەوە و تاسەیەکی بێ گەردیشی پێ دەبەخشێت بۆ کۆچ کردن و ڕۆیشتنی بەرەو چەند خانە و لانەیەکی تر.

**ڕووی چوارەم:** خوای گه‌وره‌ به‌ نووری ئیمان بۆ مرۆڤی ئیمانداری ڕوون ده‌كاته‌وه‌ كه‌ "مردن" له‌ناودان(إعدام) نی‌یه‌، به‌ڵكو جێگا گۆڕینه‌ و.. "گۆڕ"یش ده‌می بیرێكی قووڵ نی‌یه‌، به‌ڵكو ده‌رگایه‌كه‌ به‌سه‌ر چه‌ند جێهانێكی نوورانیدا خراوه‌ته‌ سه‌رپشت و، "دنیا"ش به‌ هه‌موو جوانی و ئارایشته‌كانیه‌وه‌ له‌ چاو فراوانی و جوانیی دواڕۆژدا له‌ حوكمی به‌ندیخانه‌یه‌كی ته‌نگ و تاردایه‌. خۆ گومان له‌وه‌شدا نی‌یه‌ كه‌: ده‌رچوون له‌ به‌ندیخانه‌ی دنیا و، ڕزگاربوون له‌ ته‌نگ و تاریی گیر و گرفته‌كانی و، ڕۆشتن بۆ باخ و بێستانی به‌هه‌شته‌كانی دواڕۆژ و، گواستنه‌وه‌ له‌و بارودۆخانه‌ی كه‌ ژیانی ماددیی پڕ له‌ بێزاری له‌ مرۆڤ لێڵ ده‌كه‌ن به‌ره‌و جیهانی حه‌وانه‌وه‌ و دڵنیایی و، فڕینی "گیان" و خۆ ده‌رباز كردنی له‌ غه‌ڵبه‌غه‌ڵبی نێوان بوونه‌وه‌ران و شاد بوونی به‌ ئاماده‌یی حوزووری خوای په‌روه‌ردگار، كه‌ سه‌رتاپا ڕه‌زامه‌ندی و دڵنیایی و هێمنی‌یه‌، هه‌موو ئه‌مانه‌ی باس كران، له‌ ڕاستی‌دا، بریتین له‌ گه‌شتێك به‌ڵكو له‌ به‌خته‌وه‌ری‌یه‌كی ئه‌وتۆ كه‌ شایانی ئه‌وه‌یه‌ هه‌زار و یه‌ك قوربانیی له‌ پێناودا بدرێت!

**ڕووی پێنجه‌م:** هه‌ركه‌سێك گوێ له‌ قورئانی پیرۆز ڕابگرێت، خوای گه‌وره‌ ئه‌و زانستی حه‌قیقه‌ته‌ی فێر ده‌كات كه‌ له‌و قورئانه‌دایه‌ و، به‌ نووری حه‌قیقه‌تیش ماهییه‌تی دنیای پێ ده‌ناسێنێت، هه‌تا وای لێ دێت خۆشه‌ویستیی دنیا به‌ لایه‌وه‌ ده‌بێت به‌ كارێكی بێ‌نرخ و بێ واتای ئه‌وتۆ كه‌ ته‌نانه‌ت شایانی ئاوڕ لێدانه‌وه‌شی نه‌بێت. واته‌ پێی‌ده‌ڵێت و بۆیشی ده‌چه‌سپێنێت كه‌:

دنیا كتێبێكی په‌روه‌ردگاری و صه‌مه‌دانیی وه‌هایه‌ كه‌ له‌ به‌رچاوی خاوه‌ن هه‌ستاندا كراوه‌ته‌وه‌ و، پیت و وشه‌كانیشی نوێنه‌ری خۆیان نین به‌ڵكو به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر زات و سیفه‌ت و ناوه‌ جوانه‌كانی به‌دیهێنه‌ریان.. له‌به‌ر ئه‌وه‌، تۆش له‌ واتاكانیان تێ‌بگه‌ و وه‌ریان بگره‌ و، نه‌خش و نیگاره‌كانیان فه‌رامۆش بكه‌ و، ئنجا برۆ ڕێی خۆت بگره‌به‌ر..

هه‌روه‌ها بزانه‌ كه‌ ئه‌م دنیا كێڵگه‌ی ئه‌ودنیایه‌. كه‌واته‌ شتی باشی تێدا بچێنه‌ و به‌روبووم و داهاته‌كانیشی دروێنه‌ بكه‌ و بیانپارێزه‌ و، خه‌وش و چه‌په‌ڵی‌یه‌ فانی‌یه‌كانی فه‌رامۆش بكه‌..

هه‌روه‌ها بزانه‌ كه‌ دنیا: چه‌ند كۆمه‌ڵه‌ ئاوێنه‌یه‌كی یه‌ك له‌ دوای یه‌كن. كه‌واته‌ له‌گه‌ڵ ئه‌و كه‌سه‌دا ئاشنا ببه‌ كه‌ تیایاندا ده‌رده‌كه‌وێت و، ڕووناكی‌یه‌كانی ئه‌و ببینه‌ و، له‌ واتای ناوه‌ جوانه‌كانی تێ‌بگه‌ كه‌ له‌و ئاوێنانه‌دا ده‌رده‌كه‌ون و، خاوه‌نی ئه‌و ناوانه‌ت خۆش بوێت و

پەیوەندی بەو پارچە شووشانەوە مەبەستە کە هەموو دەم و ساتێك شکان و نەمانیان لە ڕێدایە..

هەروەها بزانە کە دنیا: جێگایەکی کاتیی بازرگانییە، کەواتە تەنها سەرگەرمی ئەو کڕین و فرۆشتنە بە کە خراوەتە ئەستۆت و، بە هەناسەبڕکێ دوای ئەو کاروانانە مەکەوە کە بەجێیان هێشتوویت و فەرامۆشیان کردوویت، دەنا بە ناحەق ماندوو دەبیت..

دڵنیابە ئەم دنیایە سەیرانگایەکی کاتییە.. لەبەر ئەوە، تۆش تەنها بۆ مەبەستی پەند و ئامۆژگاری سەیرانی تێدا بکە و چاوی پێدا بگێڕە و، بە وردی سەرنجی ئەو ڕووە جوانە شارراوەیە بدە کە ڕووی لە خواوەندی باقی و خاوەن جوانییە و، پشت لەو ڕووە چەپەڵە ناشیرینە هەڵبکە کە ڕووی لە هەوا و ئارەزووی نەفسە. لەو کاتەشدا کە پەردەکان دادەدڕێنەوە و ئەو دیمەنە جوانانەت لە بەرچاودا دادەپۆشن، تۆ وەك منالی نەفام بۆیان مەگری!

هەروەها دڵنیابە ئەم دنیایە: میوانخانەیە و تۆش میوانێکی ڕێز لێ گیراویت تیایدا. کەواتە هەر تەنها بە ئیزن و فەرمانی خانەخوێ و خاوەنی میوانداریەکەت بخۆ و بخۆرەوە، پاشان سوپاسگوزاریی خۆتی پێشکەش بکە. پاشان کە ماوەی میوانداری تەواو بوو، بەجێی بهێڵە و ئاوڕ بۆ دواوە مەدەرەوە! نەکەی خۆت لە شتانێکدا هەڵبقورتێنیت کە هیچ پەیوەندییەکیان بە تۆوە نییە و هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنن! هەرگیز خۆت بەو کارانەی دنیاوە سەرقاڵ مەکە کە دەڕۆن و بەجێت دەهێڵن.

بەم جۆرە و بەم چەشنە ڕاستییە ڕوون و ئاشکرایانە، خوای گەورە گەلێ ئازاری جودایی دنیا لەسەر شانی مرۆڤ سووك دەکات. تەنانەت خوای گەورە بە دەرخستنی نهێنییەکانی دنیا و ئاسەوارێکی میهرەبانییە فراوانەکەی خۆی لە هەموو کار و هەموو شتێکدا، جودایی دنیا لای کەسانی وریا و بێدار خۆشەویست دەکات!

هەروەك قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئەم پێنج ڕووە دەکات، چەندین ئایەتی پیرۆزی تریش هەن کە ئاماژە بۆ چەند ڕوویەکی تری تایبەتی دەکەن.

دەسا بەدبەختی بۆ ئەو کەسەی کە هیچ بەشێکی لەم پێنج ڕووە دەست نەکەوتبێت!

* * *

## مەقامی دووهەمی
## وتەی حەڤدەهەم(١)

### سکالاّ بەلاّیە

کاکی داماوی بێچارە! واز لە سکالاّ و هاوار بهێنە و، پشت بـە خـوای گـەورەی خـۆت ببەستە..

چونکە سکالاّ - خۆی لە خۆیدا - بەلاّیـەکی ئاوێتەی بەلاّیـە و گوناهێکـە لـە دووتوێی گوناهباریدا.

* * *

گـەر بـە بۆنـەی ئـەم بەلاّیەتـەوە "بەلاّبـەخش" بناسیت و بیدۆزیتـەوە، ئـەوا بەلاّکـەت لـە ڕاستیدا دەبێت بە بەخششێکی مەزن و سەفایەکی یەکجار زۆر.

کەواتـە واز لـە سـکالاّ بهێنـە و، قـازانجی شـوکرانەبژێری دەسـتی خـۆت بخـە، چونکـە زەردەخەنەی گوڵ لە شەوقی ڕووی: "بولبولی عاشقیەتی"!

* * *

ئەوەتا دنیاکەت - بە بێ خواناسی - سەرانسەر ئازارە و هەردەم ڕوو لە نەمانە.

کەواتە وەرە لەم بەلاّیەدا پشت بە خوا ببەستە..

بۆچی بەم جۆرە لە دەست بەلاّیەکی بچووك هاوار دەکەیت، کـە لـە هـەمان کـاتدا پڕ بـە دنیا کۆڵی بەلاّت لەسەر شانە؟!

* * *

زەردەخەنەی "تـەوەککول" لـە ڕووی بـەلاّدا بنوێنـە، بـا ئـەویش بـە پێکـەنین بـەرەو ڕووت بێتەوە..

---

(١) ئەم بڕگانەی مەقامی دووهەم لـە شـیعر دەچن، بـەلاّم شـیعر نین و مەبەستی هۆنینەوەیان تێدا ڕەچاو نـەکراوە. بەلّکو تەواویی هۆنینی ڕاستییەکانی، وای لـێ کردووە شێوەیەکی هۆنراو بگرنە خۆیان. (دانەر)

ئێمەش لە کاتی وەرگێڕانیدا بـۆ کـوردی، بـە وێنـەی چاپـە عەرەبییەکـە، تەنـها ناوەرۆکمـان ڕەچـاو کـردووە. (وەرگێڕ)

چونکە هەتا ئەو لە پێکەنیندا بێت، ئەوا هێدی هێدی بچووك دەبێتەوە، تا بە تەواوی نامێنێت.

* * *

کاکی لەخۆبایی! بزانە کە بەختەوەریی دنیا لەوەدایە: وازی لێ بهێنرێت..

گەر باوەڕت بە خوا هەیە، ئەوا تەنها ئەوت بەسە، با واز لە هەموو دنیایش بهێنیت، چونکە ئەو کاتە هەموو شتێکت لەگەڵدا دەبێت.

* * *

خۆ ئەگەر لە خۆیشت ڕازی بیت، ئەوا تیادەچیت و، هەر کارێکیش بکەیت، هەموو شتێك لە دژت ڕادەوەستێت.

کەواتە لە هەردوو حاڵەکەدا - چار نی‌یە - دەبێ دەستی لێ هەڵبگریت.

* * *

وازهێنانیش لە دنیا بریتی‌یە لەوەی کە بزانیت: دنیا موڵکی خوایە و، دەبێ بە ڕوخسەت و ناوی خۆیەوە بۆی بڕوانرێت.

ئەگەر بازرگانی‌یەکی قازانج بەخشت دەوێت، ئەوا لەوەدایە کە: ئەم تەمەنە فانی و تیاچووەت بە تەمەنێکی هەمیشەیی و بێ کۆتایی بگۆڕیتەوە.

* * *

خۆ ئەگەر هەوا و ئارەزووەکانی نەفسیشت دەوێت، ئەوا بزانە ئەو ئارەزووانە، لەناودەچن و بێ‌نرخ و لاوازن.

گەر چاو بە ئاسۆکانی دەرەوەی خۆیشتدا دەگێڕیت، ئەوا بزانە کە هەر هەموویان مۆری فەنایان لەسەر نەخشاوە.

* * *

کەواتە دنیا شایانی کڕین نی‌یە! چونکە کەرەسەکانی ناو ئەم بازارە تێکڕا ساختە و قەڵبن!

لەبەر ئەوە، تۆیش دەستی لێ دابشۆ و هیچی لێ مەکڕە و تەنها بە ناوی‌دا گوزەر بکە، چونکە کەرەسەی ڕەسەن بۆ ماوەی دوای دنیا ئامادە کراوە!

## نامۆیانی سەرسامی

**(لەسەر چڵەپۆپەی درەختی "شاتوو"ی بە پیت و پیرۆزدا سەعیدی کۆن ئەم ڕاستییانەی بە زمانی سەعیدی نوێ باس کرد):**

لەم گفتوگۆیەدا ڕووی دەمی قسەم لە "ضیـاء پاشا"[1] نییە، بەڵکو لەگەڵ هەموو شەیدایانی ئەورووپا دەدوێم.

قسەکەریش "نەفس"م نییە، بەڵکو "دڵ"مە کە قوتابیی قورئانە.

* * *

وتەکانی پێشوو هەموویان ڕاستین، نەکەی سەرت لێ تێکبچێت و سنووریان بشکێنیت.

لە ڕێ لامەدە و، گوێ بۆ بیری بیانی ڕامەگرە، چونکە ئەو بیرەی ئەوان گومڕاییە و پەشیمانیی لەدوایە.

* * *

ئایا نابینی کامەی لە هەموان زیاتر بیری فراوانە و بینایی تیژترە، هەمیشە لە سەرگەردانیدا دەڵێ:

ئاخ! وەها سەرم لێ شێواوە کە نازانم لە دەست کێ و لای کێ سکاڵای خۆم بکەم!

* * *

وا من قورئان دەمخاتە گوفتار و، بێ هیچ دوو دڵییەك دەڵێم:

سکاڵای خۆی لای خۆی دەکەم و، وەك تۆ سەرگەردان نابم!

* * *

لەتاو "حەق" هانا بۆ لای "حەق" دەبەم و، سنووری خۆم ناشکێنم.

لە زەوییەوە بانگ لە ئاسمان دەکەم و، وەك تۆ هەڵ نایەم.

* * *

هەموو بانگەوازێکی قورئانی پیرۆز لە ڕووناکییەوەیە بۆ ڕووناکی، ئیتر من وەك تۆ پەیمان ناشکێنم.

---

(١) ضیاء پاشا: شاعیرێکی تورکە لە نێوان ساڵەکانی (١٨٢٥ز-١٨٨٠ز)دا ژیاوە و، یەکێکە لە هەواخواهانی نوێکاری و. لە "کۆمەڵەی عوسمانییە نوێکان"دا بووە. پاشان کۆچی کردووە بۆ پاریس. دوو دیوانی هەیە: (زەفەرنامە) و (خەرابات). مرۆڤێکی گەلێ زیرەك بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لە بەرامبەر دانستی کارگێڕی خوای گەورە لە گەردووندا گەلێ سەرسام بووە. بڕوانە فەرهەنگی تورکیی: (**Yeni Lügat**). (وەرگێڕ)

لـە قورئـانی پیرۆزدا دانایی ڕاسـتەقینە هەیـە، کەواتـە مـن ئـەو دانایی‌یـەی قورئـان دەچەسپێنم و، هیچ بایەخێك بە فەلسەفەی پێچەوانەی قورئان نادەم!

گەنجینەکانی ڕاستی لە قورئاندان..

گیانی خۆمیان لە پێناودا بەخت دەکەم و، وەك تۆ نایانفرۆشم!

* * *

لە خەڵکەوە ڕووە و حەق چاودەگێڕم و، وەك تۆ ڕێ ون ناکەم!

بەسەر ڕێی دڕکاویدا دەفڕم و، وەك تۆ پێی پێدا نانێم!

شوکرانەبژێریم بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە و، وەك تۆ سەرپێچی ناکەم!

* * *

"مردن" بە هاوڕێ دەزانم و، وەك تۆ لێی ناترسم!

بە ڕووی گەشاوە و سوورەوە دەچمە ناو "گۆڕ"، وەك تۆ لەرزم لـێ نایەت!

* * *

من وەك تۆ "گۆڕ" بە: دەمی هەژدیها و پێخەفی سامناکی و دەرگای نەمان، نازانم!

بەڵکو بە لای منەوە "گۆڕ": جێی بەیەك گەیشتنەوەی خۆشەویستانە.. کەواتە من وەك تـۆ ڕقم لێی نی‌یە و بێزار نیم!

* * *

لێی ناترسم و پێی دڵتەنگ نیم..

چونکە: دەرگای میهرەبانی و، ڕووناکی و، ڕاستی‌یە و..

بە ناوی خوا لەو دەرگایە دەدەم و ئاوڕ بۆ دواوە نادەمەوە و، سەرسامی نامگرێت!

* * *

ئیتر بـە چـاوی ڕوون و ڕووی گەشـاوە تیـای‌دا ڕادەکشـێم و سوپاسـی پـەروەردگارم دەکەم و، تەنگانە و سامناکیی تێدا بەدی ناکەم و..

بەدەم زایەڵەی بانگی "الله أکبر"ی حەشرەوە هەڵدەستم و..

لە مەحشەری هەرە مەزن ناترسم و..

لەو مزگەوتە گەورەیەش دوا ناکەوم!

* * *

هەرگیزاو هەرگیز لە: لوتفی خوا و.. نووری قورئانی پیرۆز و.. ڕێژنەی ئیمان.. نـائومێد نابم.

بەڵکو تێ‌دەکۆشم و، ڕووەو عەرشی خوای میهرەبان دەفڕم و..

پشت بەخوا - وەك تۆ - سەرگەردان نابم!

## ئەم موناجاتەم بە زمانی فارسی و بەم جۆرەی خوارەوە بەدڵدا هات

**(ئەم موناجاتەم چۆن بە زمانی فارسی بە دڵدا هات، هەر بەوجۆرەش نووسرایەوە و لە ناوەندی پەیامی** "حُبابٌ من عُمانِ القرآن الكريم"**دا بڵاو کرایەوە).**

"یارب! به شش جهت نظر می‌کردم درد خودرا درمان نمی دیدم".

ئەی پەروەردگارم! لەو کاتەدا کە من، بە بێ ئاگایی، پاڵم بە توانا و ئیختیاری خۆمەوە دابوو و پشتم بە تۆ نەبەستبوو، بۆ مەبەستی دۆزینەوەی دەرمانی دەردەکەم سەیری هەر "شەش" لاکانی خۆمم کرد، بەڵام بە داخەوە نەمتوانی دەرمانێك بۆ دەردەکەم بدۆزمەوە.. تا لە "مەعنا"دا پێم وترا: ئایا خودی دەردەکەت دەرمانێکی سەروزیاد نی‌یە؟!

"در راست می‌دیدم که: دیروز مزار پدر من است".

بەڵێ، بۆ ئەوەی دڵنەواییم دەست بکەوێت، بە بێ ئاگایی‌یەوە سەیری "ڕابوردوو"ی لای ڕاستم کرد، کەچی بینیم "دوێنێ" - لای ڕاست - گۆڕی باوکمە و ڕۆژگارانی ڕابوردووش گۆڕستانێکی مەزنی باپیرانی منن! بەم جۆرە، ئەم لایە، لە بریی دڵنەوایی، بێزاری و دڵتەنگیی بۆ فەراهەم هێنام(١).

(١) بەڵام ئیمان ئەم گۆڕستانە مەزنە، بە کۆڕێکی ڕووناك و ئەنجومەنێکی هاودەمی و دڵنەوایی‌بەخشی هەموو خۆشەویستان پیشان دەدات.

"ودر چپ دیدم که: فردا قبر من است".

پاشان بە لای چەپمدا سەیری "داهاتوو"م کرد، لەوێشدا نەمتوانی دەرمانێك بۆ دەردەکەم پەیدا بکەم. تەنانەت "سبەینێ"م لە شێوەی گۆڕەکەی خۆمدا بینی و داهاتووشم بە گۆڕی هاووێنەکانی خۆم و نەوەی داهاتوو هاتە بەرچاو! واتە ئەم لایەش لە بریی دڵنەوایی، بە هەمان جۆر بێزاری و دڵتەنگیی بۆ بەجێ‌هێشتم(٢).

(٢) بەڵام چ ئیمان و چ دڵنیایی بەرهەمی ئیمان، ئەو گۆڕستانە بە بانگێشتنی میهرەبانیی خواوەند بەرەو کۆشك و تەلارە نیانەکانی بەختەوەریی هەمیشەیی، پیشان دەدەن.

"وامروز: تابوت جسم پر اضطراب من است".

کە لە لای چەپیش نائومێد بووم، سەیری ئەمڕۆ(ئێستا)م کرد.. دەبینم "ئەمڕۆ"م بە چەشنی تابووتێك دێتە بەرچاو کە جەستەی منی لە خۆیدا هەڵگرتووە، ئەو جەستەیەی کە بە وێنەی هەڵبەزینەوەی مەل لە نێوان ژیان و مردندا ئۆقرەی لێ بڕاوە(٣).

(٣) بەڵام ئیمان، ئەو تابووتە بە وێنەی مەڵبەندی بازرگانی و خانەیەکی ڕووناکی میواندار‌ی، پیشانی ئیماندار دەدات.

"بر سرِ عُمر جنازهء من ایستاده است".

کە لەم لایەش دەرمانی دەردەکەم دەست نەکەوت، ناچار سەرم بەرز کردەوە و بۆ لای "سەرەوە"م ڕوانی و سەیری چلەپۆپەی درەختی تەمەنی خۆمم کرد، بینیم تەرمەکەم تاقە بەری درەختی تەمەنمە و لەوێ ڕاوەستاوە و سەیرم دەکات!(٤).

(٤) بەڵام ئیمان دەری دەخات کە ئەو بەرەی درەختی تەمەن "تەرم" نییە، بەڵکو دەربازبوونی "گیان"مە - کە بۆ هەتاهەتایی دەستنیشان کراوە - لە هێلانە دێرینەکەی خۆی بەرەو ئاسۆی ناو ئەستێرەکان!

"در قدم: آب خاك خلقت من و خاكستر عظام من است".

کە بە هەمان جۆر لەم لایەش نائومێد بووم، سەرم داخست و بۆ "خوارەوە"م ڕوانی، دەبینم خاکی ئێسکی پرتووکاوم هاودەم لەگەڵ خاکی سەرەتای دروستبوونمدا تێکەڵی یەکتری بوون و، پێیان پێدا دەنرێت! ئەم لایە - بەم جۆرە - دەردەکەمی پتر بۆ زیاد کردم و هیچ دادێکی نەدام و نەهات بە فریا و هانامەوە(٥).

(٥) بەڵام ئیمان دەری خست: ئەو خاکە دەرگای میهرەبانییە و پەردەیەکە بەسەر ڕووی هۆڵی بەهەشتدا دادراوەتەوە.

"چون در پس می‌نگرم، بینم: این دنیای بی بنیاد هیچ در هیچ است".

ئنجا ڕووی خۆمم لەو لایەش وەرچەرخاند و ئاوڕم بۆ لای "دواوە" دایەوە، دەبینم دنیای فانی لە شیو و دۆڵ و کەندەڵانی تاریکی و بێمەبەستییەوە بەرەو خوار بەر دەبێتەوە. بەم جۆرە ئەم لایەش لە بریی ئەوەی دڵم بداتەوە، ژەهری ترس و زام و بێ هاودەمیی کرد بەسەر زامەکەمدا و پتر بۆی هێنامەوە سۆ(٦).

(٦) بەڵام ئیمان دەری خست کە ئەو دنیایەی وامەزانی لەناو تاریکیدا تلێر دەبێتەوە، لە ڕاستیدا چەند نووسراوێکی صەمەدانیی خواوەند و چەند لاپەڕەیەکی نەخش و نیگارەکانی ئەو خوایەن کە ئەرکی سەرشانیان بەجێ هێناوە و لە بریی خۆیان ئەنجامی کارەکانیان لە "بوون"دا بەجێ هێشتووە.

"ودر پیش: اندازهء نظر می‌کنم، درِ قبر گشاده است و راه ابد به دور و دراز به دیدار است".

کە هیچ خێرێکم لەم لایەش دەستگیر نەبوو، سەیری "بەردەم"ی خۆمم کرد. دەبینم: لە سەرەتای ڕێگاکەمدا دەرگای گۆڕەکەم لێ کراوەتەوە و، لە پشتی ئەو گۆڕەشەوە ڕێگای ئەبەدم لە دوورەوە لێ دیارە(٧).

(٧) بەڵام ئیمان ئەو دەرگای گۆڕە دەکات بە دەرگایەك بۆ جیهانی ڕووناکی و، ئەو ڕێگایەش دەگۆڕێت بە ڕێگای بەختەوەریی هەمیشەیی. کەواتە بە ڕاستی "ئیمان" بوو بە مەڵهەمی شیفابەخش و سارێژکاری دەردەکەم.

"مرا جُز جُزء اختیاری چیزی نیست در دست".

بەم چەشنە، لەم شەش لایەدا هیچ دڵدانەوە و دڵنەواییەکم دەستگیر نەبوو، بەڵکو لە سام و ترس زیاتر هیچی ترم دەست نەکەوت. خۆ منیش لە بەرامبەری ئەو هەموو زام و دەردانەوە جگە لە "جوزئی ئیختیاری" هیچی ترم شك نەدەبرد(٨).

(٨) بەڵام ئیمان لە بریی ئەو جوزئی ئیختیاری‌یە، بەڵگەنامەیەکم دەداتێ کە دەتوانم بە هۆیەوە پاڵ بە توانستێکی ڕەهای مەزنەوە بدەم، تەنانەت هەر ئیمان خودی خۆی دەبێت بەو بەڵگەنامەیە.

"که او جُزء: هم عاجز، هم کوتاه، وهم کم عیار است"!

ئەو جوزئی ئیختیاری‌یەش کە چەکی مرۆڤە، گەر سەرنجی بدەیت، دەبینیت: کۆڵەوار و دەستکورت و ناتەواوە و جگە لە دەستکەوت(الکسب) توانای بەدیهێنان(الخلق)ی نی‌یە(٩).

(٩) بەڵام ئیمان وا لەو جوزئی ئیختیاری‌یە دەکات کە سەروزیادی هەموو شتێك بێت، چونکە لە پێناوی خوادا بەکاری دەهێنێت، وەکو ئەو سەربازەی لە سوپای دەوڵەتدا خزمەت دەکات، دەتوانێت لەم ڕێیەوە کاری وا ئەنجام بدات کە بە هەزاران جار لە سەرووی توانستی خۆیەوە بێت.

"نه در ماضی مجال حلول.. نه در مستقبل مدار نفوذ است".

چونکە ئەو جوزئی ئیختیاری‌یە ناتوانێت بڕواتە ناو "ڕابوردوو" و "داهاتوو"ی مرۆڤەوە، کەواتە سەبارەت بە ئاوات و ئازارەکانی ڕابوردوو و داهاتووەوە چ سوودێکی تێدا نی‌یە(١٠).

(١٠) بەڵام ئیمان جڵەوی ئەو جوزئی ئیختیاری‌یە لە دەست جەستەی ئاژەڵانەی مرۆڤ دەسێنێتەوە و دەیداتە دەست "دڵ" و "گیان"ی. ئەو کاتەش مرۆڤ دەتوانێت بڕواتە ناو "ڕابوردوو" و "داهاتوو"ەوە، چونکە بازنەی ژیانی دڵ و گیان تابلێی فراوانە.

"میدان او: این زمان حال، ویك آن سیال است".

مەیدانی هاتوچۆی ئەو جوزئی ئیختیاری‌یە تەنها کاتی ئێستایە کە ساتێکی کورت و کاتی و کەم خایەنە.

"با این همه فقرها وضعفها، قلمِ قدرتِ تو آشکارا نوشته است در فطرت ما: میلِ ابد واملِ سرمد".

سەرەڕای ئەم هەموو پێداویستی‌یانە و، سەرباری لاوازی و هەژاری و کۆڵەواریم و، وێڕای هێرش هێنانی ئەم گشت سام و ترس و بیمانەش کە لەم شەش لایەنەوە کرانە سەرم، گەلێ ئاواتی تا ئەبەد خایەن لە ماهییەتمدا و چەندەها ئارەزووی ڕوون و زەبەندەش بە قەڵەمی قودرەت، لە فیترەتمدا نووسراون.

"بلکه هر چه هست، هست".

تەنانەت هەر شتێك لە دنیادا هەیە، نموونەکانی لە فیترەتی منیشدا هەن. کەواتە من پەیوەندی‌یەکی بەتینم بەو ئاوات و ئارەزووانەوە هەیە، بەڵکو هەوڵیشیان بۆ دەدەم، تەنانەت هەست دەکەم دەستێك هەیە پاڵم پێوە دەنێت و هانم دەدات کە هەوڵیان بۆ بدەم.

"دائرهء احتیاج مانند دائرهء نظر بزرگی دار است".

بازنەی موحتاجی و پێویستی‌یەکانم، بە ئەندازەی فراوانیی بازنەی بینینم گەورە و فراوانە.

"خیال کدام رسد احتیاج نیز رسد، در دست هرچه نیست در احتیاج هست".

تەنانەت ئەندێشەی مرۆڤ تا کوێ بڕ بکات، بازنەی موحتاجیشی تا ئەوێ دەڕوات. کەواتە موحتاجی‌یەکانی تا ئەوێش دەگات، بگرە ئەو شتانەش کە مرۆڤ دەستی پێیان ناگات هەر لە ناوەندی پێداویستی‌یەکانیدان، خۆ ئەو پێداویستی‌یانەش کە دەستی مرۆڤیان پێ ناگات هێندە زۆرن لە ژمارە نایەن.

"دائرهء اقتدار همچو دائرهء دست کوتاه کوتاه است".

کەچی بازنەی توانستی مرۆڤ تابڵێی تەسك و کورتە و هەر هێندەیە کە دەستی پێی دەگات.

"پس فقر و حاجات ما به قدر جهان است".

واتە: هەژاری و پێداویستی‌یەکانیشم بە ئەندازەی هەموو دنیا دەبن.

"سرمایهء ما همچو (جُزء لا یتجزأ) است".

بەڵام دەستمایەکەم شتێکی یەکجار کەمی بچووکە.

"این جزء کُدام واین کائنات حاجات کُدام است".

دیارە ئەو پێداویستی‌یانەی کە بە ئەندازەی ئەم جیهانە دەبن و، بە ملیارەهای وەك ئەو جوزئە ئیختیاری‌یە بێ کەڵکە نەبێ نایەنەدی، هەرگیز بەم دەستمایە کەم نرخ و هەرزانە ناکڕێن و دەست ناخرێن.

کەواتە دەبێ مرۆڤ بە دوای هۆکارێکی تردا بگەڕێت..

"پس در راه تو، ازین جُزء باز می‌گذشتن چارهء من است".

ئەو "هۆکار"ەش بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤ دەست لەو جوزئە ئیختیاری‌یە بشوات و کارەکانی خۆی بە تەواوی بە ویستی خوای گەورە بسپێرێت و دەستبەرداری هێز و توانای

خۆی ببێت و هانا بۆ هێز و توانای خوای گەورە ببات. بەم کارەشی دەستی خۆی لە پەتی "تەوەککول" گیر دەکات.

کەواتە ئەی پەروەردگارم! مادەم هۆی ڕزگاربوون تەنها لەمەدایە، ئەوا لە پێناوی تۆدا واز لەم جوزئی ئیختیاریەش دەهێنم و دەستبەرداری خۆویستی(أنانیة)ی خۆم دەبم!

"تا عنایت تو دستگیر من شود، رحمت بی نهایت تو پناه من است".

بەشکو چاودێریی تۆ بەزەیی بە کۆڵەواری و هەژاریمدا بێتەوە و دەستم بگرێت و، سۆزی میهرەبانی‌یەکەشت بێت بە هانای هەژاری و پێداویستی‌یەکانم و پشتم بگرێت و دەرگای خۆیم لێ بکاتەوە!

"آن کس که بحر بی نهایت رحمت یافت، تکیه نکند برین جُزءِ اختیاری که یك قطره سراب است"!

بەڵێ، هەرکەسێك دەریای فراوان و بێ لێواری میهرەبانی بدۆزێتەوە، هەرگیز لە بریی ئەو میهرەبانی‌یە پشت بە جوزئی ئیختیاریی خۆی نابەستێت کە وەك دڵۆپێکی ناو سەرابێك وایە!

"ایواه! این زندگانی همچو خواب است
وین عمر بی بنیاد همچو باد است"!

ئای داخەکەم! ئێمە خەڵەتاین و لەخشتە براین! چونکە لەو گومانەدا بووین کە ئەم ژیانەی دنیا هەمیشەیی و بەردەوامە، بەم گومانەشمان هەموو شتێکمان لە کیسی خۆمان دا!

بەڵێ، ژیان وەنەوزێك بوو وەکو خەونێك لێمان گوزەشت..
ئەم تەمەنەش ڕانەوەستا..
وەك بای قایم..
هەڵی کرد و ئێرەی جێ‌هێشت!

"انسان به زوال دنیا به فناست، آمال بی بقا آلام به بقاست".

ئەو مرۆڤەی کە لە خۆی بایی بووە و لە هەڵسوکەوت و بیرکردنەوەکانی خۆی ڕازی‌یە و پێی وایە هەتاهەتایە هەر دەمێنێتەوە و ئێرە بەجێ ناهێڵێت، ئەو مرۆڤە حوکمی نەمانی لەسەر دەرکراوە و خێرا دەڕوات و ئەم ژیانە بەجێ‌دەهێڵێت..

ئەم دنیایەش کە خانە و لانەی ئەوە، بەرەو تاریکستانی "نەبوون" دەکەوێتە خوار و سەرجەم ئاواتەکانی مرۆڤیش بە ناکامی لەگەڵ خۆی‌دا بەرەو گۆڕ بەڕێ دەکرێن و هیچیانی بۆ نایەنەدی و.. ئازارەکانیشی لەناو گیانی ئەودا وەك نەخشی سەنگ هەڵدەکەنرێن و هەتا ماوە بە سۆیانەوە هەڵدەقرچێت و بە ئازارەوە دەتلێتەوە.

"بیا ای نفس نافرجام! وجود فانی خودرا فداکن خالق خودرا که این هستی ودیعه هست".

دەسا ئەی نەفسە تاسەمەندەکەی ژیان و داخوازی تەمەنی درێژ و شەیدای دنیا و گیرۆدەی ئازار و ئاواتی هەتاهەتایی بێسنوور!

ئەی دەروونە بەدبەختەکەم! خێرا بێدار بەرەوە و وەرەوە سەر هۆشی خۆت.. ئایا نابینیت ئەو گوڵەستێرەیەی کە پشت بە ڕووناکییە کز و لاوازەکەی خۆی دەبەستێت، چۆن گرفتاری شەوەزەنگ و تاریکایی شەوی تار دەبێت، کەچی ئەو هەنگەی بە خۆی نانازێت، ڕووناکیی خۆری دەستگیر دەبێت و، گوڵانی هاودەم و هاوڕێشی بەهۆی تیشکدانەوەی ڕووناکیی خۆر لەسەر ڕوویان وەك زێڕ لە بەرچاویدا دەبریسکێنەوە؟!

ئەی نەفسەکەم! تۆش بەو جۆرەیت، چونکە ئەگەر پشت بە "بوون" و "خۆویستی" و "خود"ی خۆت ببەستیت، وەك گوڵەستێرەکەت لێ دێت و حەواڵەی تاوانی خۆت دەکرێیت، بەڵام گەر "بوون"ی خۆت لە پێناوی ئەو بەدیهێنەرە بەخشندەیەی خۆتدا بەخت کرد کە ئەو "بوون"ەی پێبەخشیویت، ئەوا وەکو هەنگت لێ دێت و، "بوون" و "ڕووناکی"ی لەسنوور بەدەرت دەستگیر دەبێت..

کەواتە:

خۆت لەو پێناوەدا بەخت بکە!

چونکە ئەم "بوون"ەی خۆت ئەمانەت و سپاردەی ئەون لات دانراون!

"وملك او و او داده فناكن تا بقا يابد، ازان سرّى كه: (نفي نفي اثبات) است".

پاشان ئەم "بوون"ەی تۆ موڵکی خوای گەورەیە و هەر ئەویش پێی بەخشیویت. کەواتە بێ هیچ منەت و دوودڵییەك لە پێناوی ئەودا بەختی بکە با لەم ڕێیەوە مانەوەی دەست بکەوێت، چونکە: "نفي النفي إثباتٌ"!

واتە: گەر "نەبوون" لەناو بچێت دەبێت بە "بوون" و، گەر شتی "نەبوو"ش لەناو ببرێت دەبێت بە شتێکی "خاوەن بوون"!

"خداى پركرم خود مُلكِ خودرا مى خرد از تو
بهاى بى كران داده براى تو نگهدارد"

خوای گەورەی بەخشندە و میهرەبان موڵکی خۆیت لێ دەکڕێتەوە و بەهایەکی گەورەشی لە بەرامبەرەوە پێ داویت کە بەهەشتە. ئنجا کە دەیشی کڕێتەوە لێت، دەیپارێزێت بۆت و نرخی زیاد دەکات و بە تەواوترین و هەمیشەییترین شێوەش دەیگێڕێتەوە بۆ خۆت.

کەواتە ئەی نەفسەکەم! خێراکە بەدەم ئەم بازرگانییەوە بڕۆ و ڕاپەڕە، چونکە بازرگانییەکە پێنج قازانجی لە دوو توێدایە. واتە لە تەنها یەك مامەڵەدا پێنج قازانج دەکەیت و لە هەمان کاتیشدا پێنج زیانیشت لە کۆڵ دەبێتەوە.

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿فَلَمَّا أَفَلَ قالَ لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾ (الأنعام:٧٦)

لقد أبكانــــي نعيُ:

﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾

من خليل الله..

فصبّتْ عينُ قلبي قطراتٍ باكيات..

من شؤون الله!

هەواڵدانی لەناوچوونی بوونەوەران کە حەزرەتی ئیبراهیم – علیه السلام – بە ﴿لا أُحِــبُّ الآفِلِينَ﴾ ڕایگەیاند، دڵی منی بە خوڕ هێنایە گریان و، هەر دڵۆپێکـی فرمێسکەکانیشـم هێنـدە پەژارە و خەفەتیان لە ئەستۆ نرابوو کە خەمی مرۆڤیان بە تەواوی دەبزواند و ئەشکی گەشـیان پێ هەڵدەڕشت.. دڵۆپەکانی ئەو فرمێسکانەش بریتین لەم شیعرانەی کە بە زمانی فارسی هاتنە دڵمەوە و، جۆرە تەفسیرێکن بۆ فەرمایشتەکەی حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەری خـەلیلی خـوا – دروودی لەسەر بێت – کە دەفەرموێ:

﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾:

نمی زیباست "أفولده" گم شدن محبوب

"خۆشویسـتراو"ێك کـە لـە ئاسـۆی نـەماندا ئـاوا ببێـت، بـە خۆشویسـتراوێکی جـوان دانـانرێت، چونکـە ئـەو کەسـەی بڕیـاری نـەمانی لەسـەر دەرکرابێـت، هـەرگیز بـە خـاوەنی جوانیی ڕاستەقینە و تەواوەتی دانانرێت و مرۆڤ لە نـاخی دڵـەوە خۆشـی نـاوێت، ئـەوەتا ئـەو "دڵ"ەی کە لـە بنـەڕەتدا بـۆ ئـەوە خولقێـنراوە شـەیدای شـتانی نـەمر و هەمیشـەیی ببێـت و بـە وێنەی ئاوێنە نووری ڕووناکیی‌یەکانی خواوەندی گەورەی صەمەد بداتەوە، ئـەو دڵـە هـەرگیز حەزی لە "نەمان" و شایستەی ئازاری "نەبوون" نی‌یە.

نمی ارزد "غروبده" غیب شدن مطلوب

"خوازراو"ێك كە حوكمی ئاوابوونی لەسەر دەركرابێت، شایانی ئەوە نی‌یە كە بیر و دڵی مرۆڤ پەیوەستی ببن، چونكە گەلێ لەوە كۆڵەوار و دەستەوسانترە كە جێی هیوا و ئاواتەكان بێت و كردارەكانیشی بدرێنە پاڵ. مرۆڤ خەفەت بۆ نەمانی شتانی ئاوا ناخوات و هەرگیز دڵیشی شەیدای نابێت و بە دوای‌دا ناگەڕێت و ناپەرستێ.

نمی خواهم "فناده" محو شدن مقصود

"ئامانج"ێكم ناوێت كە فەنا و زەوالی لە ڕێ‌دا بێت و لە ئەنجامدا نەمێنێت. بەڵێ، من شتی "فانی"م ناوێت، چونكە من خۆیشم فانیم، ئایا شتانی بەفەناچوو چ دادێكی من دەدەن؟

نمی‌خوانم "زوالده" دفن شدن معبود

هەرگیز هانا بۆ "پەرستراو"ێك نابەم كە لەناو خاكی "نەمان"دا ئەسپەردە بكرێت.. چونكە ئەو كەسەی دەستەوسان و كۆڵەوار بێت هەرگیز ناتوانێت دەرمانێك بۆ دەردە سەختەكانم بدۆزێتەوە و زامە هەمیشەیی‌یەكانیشم سارێژ بكات.. ئایا كەسێك نەتوانێت خۆی لە چنگی نەمان ڕزگار بكات، چۆن بە "پەرستراو" دادەنرێت؟

"عقل" فریاد می دارد.. نداء: ﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾ می‌زند "روح"

"ژیری"ی مرۆڤ كە شەیدای شتانی ڕواڵەتی‌یە، هەموو جارێك كە "نەمان"ی ئەو شتانە دەبینێت شەیدایان بووە، لە ناخەوە نوقمی نائومێدی دەبێت و لە بەردەم ئەم بوونەوەرە بەرەو "نەمان" ڕۆشتووانەشدا هاوار و ناڵەی لێ بەرز دەبێتەوە..

"ڕۆح"یش كە بە دوای خۆشویستراوێكی هەمیشەیی‌دا عەودالە، بە هەنسكەوە فرمێسكی: ﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾ هەڵدەڕێژێت.

نەخێر.. نەخێر.. من جودایيم ناوێت.. چونكە ناتوانم داخی جودایی بچێژم!

نمی‌خـــــواهم نمی‌خوانم نمی‌تابم فـــراقی

نمی ارزد "مراقه" این زوال در پس تلاقی

"بەیەك شادبوون"ێك كە نەمانی بە دوادا بێت، ئازارێكی سەخت دەرخواردی مرۆڤ دەدات.. ئەم چەشنە بەیەك گەیشتنانە هەرگیز شایانی هەوڵ بۆدان و تاسەمەندی نین، چونكە هەروەك نەمانی چێژ و لەزەت ئازار بۆ مرۆڤ بەجێ دەهێڵێت، بە هەمان جۆر تەسەوور كردنی نەمانی ئەو لەزەتەش ئازاری دەرخوارد دەدات.

سەرجەمی دیوانەكانی شاعیرانی غەزەل و دڵداری - كە عاشقی مەجازین - و گشت قەسیدە و شیعرەكانیان لەو ئازارانەوە سەرچاوەیان گرتووە كە هی تەسەووری ئەو نەمانەیە.

تەنانەت گەر کاکڵە و گیانی دیوانی هەرکامێکیان هەڵبگلۆفیت دەبینیت هەر تەنها دڵۆپی هاوار و ناڵەی ئازارێکی ئەوتۆی لێ دەچۆڕێت کە هی تەسەوور کردنی نەمانی تام و چێژەکانە!

ازان دردی کزین ﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾ میزند قلبم

ئەو چەشنە بەیەك گەیشتنانەی کە ئاوێتەی "نەمان"ە و.. ئەو خۆشویستراوە مەجازییانەش کە ئازار بۆ ناخی مرۆڤ فەراهەم دەهێنن.. هێندە بە توندی "دڵ"ی دەگووشن کە وەك حەزرەتی ئیبراهیم – دروودی لەسەر بێت – ناڵەی: ﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾ی لێ بەرز دەبێتەوە!

جا ئەگەر تۆ کە هێشتا لەم دنیا فانییەدا دەژییت، بە ڕاستی بە دوای "مانەوە"دا دەگەڕێیت، ئەوا بزانە کە:

درین فانی بقاخوازی بقاخیزد "فنادن"

"مانەوە" لە ناوەندی "نەمان"دا سەرهەڵدەدات.. کەواتە "نەفسی ئەممارە"ت بە "نەمان" ببەخشە، با "مانەوە"ت دەست بکەوێت!

فنا شو، هم فدا کن، هم عدم بین
کـــــه از دنیا "بقایه" راه "فنادن"

دەستبەرداری هەر ڕەفتارێکی چەوت ببە کە هۆی دنیاپەرستی بێت و، ئەو چەشنە ڕەفتارە لە خۆتدا مەهێڵە و بە فەنای بدە.. هەر شتێکت هەیە لە پێناوی خۆشویستراوی حەقدا – کە خوای گەورەیە – بەختی بکە.. ئەنجام و پاشەڕۆژی ئەو بوونەوەرانە ببینە کە بەرەو "عەدەم" هەنگاو دەنێن، چونکە ئەو ڕێگایەی کە لەم دنیایەدا مرۆڤ بە "مانەوە" دەگەیەنێت، لە "نەمان"ەوە تێپەڕ دەبێت!

"فکر" فیراز میدارد.. انین: ﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾ میزند "وجدان"

"بیر"ی مرۆڤ کە نوقمی هۆکارە ماددییەکان بووە، لە بەردەم دیمەنی "نەمان"ی دنیادا گرفتاری نیگەرانی و سەرسامی دەبێت و لە نائومێدیی خۆیدا پەنا دەباتە بەر هاوار و فریاد..

بەڵام "ویژدان"ی کە بە دوای "بوون"ێکی ڕاستەقینەدا دەگەڕێت، لە گریە و زاریی: ﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾دا شوێن پێی حەزرەتی ئیبراهیم – دروودی لەسەر بێت – هەڵدەگرێت و، پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ هۆکارە ماددییەکاندا دەبچڕێت و دەست لە بوونەوەرانی فانی و لەناوچوو دەشوات و.. بە توندی دەستەکانی لە خۆشویستراوی ڕاستەقینە و هەمیشەیی گیر دەکات و هانای بۆ لا دەبات.

بدان ای نفس نادانم! کـــه: در هر فرد فانـــی
دو راه هست با باقی.. دو سر جان جانانـــی

دەسا ئەی نەفسی بێئاگا و نەزانم!

ئەی سەعید!

بزانە کە:

ئەگەر تۆ بتوانیت واز لە "ڕواڵەت" بهێنیت و سنووری "دەروون"ی خۆت ببڕیت و بەجێی بهێڵیت، ئەوا دەتوانیت لە ناوەندی هەموو شتێکی فانی و لەناوچووی ئەم دنیایەدا دوو ڕێگا بەرەو "مانەوە" بدۆزیتەوە! بە ڕادەیەك کە دەتوانیت هەر بۆ خۆت سەیری دوو نهێنی و دوو بریسکانەوەی جوانیی خۆشویستراوی هەمیشەیی بکەیت.

که در نعمتها إنعام هست و وپس آثارها اسما
بگیر مغزی، رمیزن در فنا آن قشر بی معنی

بەڵێ، لەسەر ڕوخساری "نیعمەتەکان"دا "نیعمەت بەخشین" بە چاو دەبینرێت و.. لە دووتوێی ئەو نیعمەتەشدا لوتف و سۆزی خواوەندی میهرەبان بەرچاو دەکەوێت.. جا ئەگەر لە ناوەندی "نیعمەت"دا توانیت "نیعمەت بەخشین" ببینیت ئەوا "نیعمەت بەخش"ت دۆزیوەتەوە!

پاشان هەموو ئاسەوارێکی خوای تاك و تەنیای صەمەد، لە ڕاستیدا، نامەیەکی نووسراوی ئەوە کە ناوە جوانەکانی بەدیهێنەرەکەیان دەخەنە ڕوو.. جا ئەگەر توانیت لە نەخش و نیگارە ڕواڵەتییەکانەوە بەرەو واتاکانی ناوەڕۆك بپەڕێیتەوە، ئەوا ڕێگایەکت دۆزیوەتەوە کە لە ناوەندی ناولێنراوەکانەوە بە "ناوە جوانەکانی خوای گەورە"ت دەگەیەنێت.

جا مادەم – ئەی نەفسەکەم! – دەتوانیت بگەیتە کاکڵە و ناوەڕۆکی ئەم بوونەوەرە فانییانە، ئەوا دەستەکانت لەو کاکڵە و ناوەڕۆکانە گیر بکە و، واز لە توێکڵەکانیان بهێنە با لافاوی فەنا بیانبات و، بێ ئەوەی خەمیان بۆ بخۆیت ئەو پەردانە بدڕێنە!

بلی! آثارها گویند:
ز اســـما لفظ پر معنی بخوان معنـــا
رمیزن در هوا آن لفظ بـــی سودا

بەڵێ، هەموو شتێکی ئەم بوونەوەرانە، وشەیەکی بەرجەستەیە کە واتا مەزنەکانی ڕادەگەیەنێت، تەنانەت زۆربەی ناوە جوانەکانی بەدیهێنەرە ناوازەکەی لە خۆیدا بەرجەستە دەکات، تاکو بە جوانی بخوێنرێنەوە..

جا مادەم ئەم بوونەوەرانە وشەی بەرجەستەی توانستی خوای گەورەن، ئەوا تۆیش – ئەی نەفسەكەم! – بیانخوێنەرەوە و سەرنج لە واتاكانیان بدە و لە ناخی دڵی خۆتدا هەڵیانبگرە و بیانپارێزە و، ئنجا وشەكانیان فەرامۆش بكە و بێ‌حەم بیاندە بە دەم باوە!

"عقل" فریاد می‌دارد.. غیاث: ﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾ بزن ای "نفس"م!

ئەو "ژیری"یەی كە گرفتاری ڕواڵەتەكانی دنیایە و جگە لە چەند زانستێكی دەرەكیی ئافاقی چیی تر شك نابات، كاتێ كە بیر دەكاتەوە، زنجیرەی بیرەكانی بەرەو "عەدەم" تەنانەت بەرەو "هیچ" دەیبەن!.. بۆیە لە سەرگەردانیدا دەشڵەژێت و لەتاو سام و بیمی هەڵوێستەكەش لەرزی لێ دێت و لە نائومێدی و ترس و لەرزدا هاوار دەكات و، بە دوای دەروویەكدا دەگەڕێت كە لەو گیروگرفتە دەربازی بكات و بیخاتە سەر ئەو ڕێیەی كە دەیگەیەنێت بە "حەقیقەت".

جا مادەم "ڕۆح" دەستی لە شتانی لەناوچووی ئاوابوو داتەكاند و.. "دڵ"یش وازی لە خۆشویستراوانی فانی هێنا و.. "ویژدان"یش پشتی لە شتانی لەناوچوو هەڵكرد.. ئەوا تۆش "ئەی نەفسە هەژارەكەم!" خێرا خۆت قورتار بكە و بە هاوار و زیكرەكەی حەزرەتی ئیبراهیم – دروودی لەسەر بێت – دەنگت هەڵبڕە و بڵێ:

﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾!

چه خوش گوید او شیدا "جامی" عشق خوی:

بڕوانە مەولانا "جامی"ی شاعیری سەرمەستی عیشق[1] چەندە جوانی وتووە، دەڵێی سروشتی ئەو بە خۆشەویستیی خوایی شێلراوە كاتێ ویستوویەتی ڕوانینی خۆی ئاراستەی "تەوحید" بكات و نەیەڵێت لە ناوەندی "زۆری"دا پەرتەوازە ببێت و، وتوویەتی:

---

(١) مەولانای جامی (٨١٧-٨٩٨ ك/١٤١٤-١٤٩٢ز) ناوی تەواوی: (نوورەدین عەبدوڕڕەحمان كوڕی ئەحمەدی كوڕی محەممەد)ە و، لە (جام)ی سەر بە (هەرات)ی ئەفغانستانی ئێستا لە دایك بووە و لە بنەچەدا خەڵكی ناوچەی ئیسفەهانە. شاعیر و نووسەر و زانا و عارفێكی ڕەببانی و مەزنی سەدەی نۆهەمی كۆچی بووەو و، پاش تەواوكردنی خوێندن حەزێكی زۆری لە تەسەووف كردووە و لای مامۆستا سەعدەدینی كاشغەری (٨٦٠ ك) كە زانایەكی سەردەمی خۆی و شێخی نەقشبەندیی ئەو ڕۆژگارە بووە، تەسەووفی وەرگرتووە. ساڵی (٨٧٧ ك) لە ڕێی (هەمەدان – كوردستان – بەغدا)وە ڕۆشتووە بۆ حەج. لە تەمەنی هەشتا و یەك ساڵیدا كۆچی دوایی كردووە. جگە لە نووسینەكانی كە دەگەنە سی و یەك كتێب و نامیلكە، سێ دیوانی شیعری ویجدانی و حەوت دیوانی مەسنەویشی بەجێ هێشتووە. بڕوانە: (نقد و بررسی آثار وشرح احوال جامی، تالیف: اعلاخان افصح زاد، چاپ اول، ١٣٧٨ هـ.ش. تهران) هەروەها: (تاریخ ادبیات ایران، تالیف: ذبیح الله صفا، تلخیص: سید محمد تـرابی. ج٣/ص١٥٢-١٥٥،چاپ پنجم ١٣٨٠ هـ.ش. تهران). (وەرگێڕ)

**یکی خواه، یکی خوان، یکی جوی    یکی بین، یکی دان، یکی گوی**[١]

واتە:

١- تەنها با "خوای تاك و تەنیا" ئامانجت بێت، چونکە جگە لەو یەکە کەسی تر شایانی ئەوە نییە ئامانج و مەبەستی مرۆڤ بێت..

٢- تەنها لە دەرگانەی "خوای تاك و تەنیا"دا بلالێرەوە، چونکە جگە لەو کەسی تر پاڕانەوەکانت گیرا ناکات.

٣- تەنها "خوای تاك و تەنیا"ت بوێ، چونکە جگە لەو کەسی تر شایانی ویستن نییە..

٤- بۆ "خوای تاك و تەنیا" بڕوانە، چونکە کەسانی تر بە هەمیشەیی نابینرێن، بەڵکو لە پشت پەردەی نەمانەوە ئاوا دەبن.

٥- "خوای تاك و تەنیا" بناسە، چونکە هەر شتێك گەر لە ناسینیدا نەگەیتە ئەنجام، سوودی لە دوا نابێت..

٦- یادی "خوای تاك و تەنیا" بکە و ناوی بهێنە، چونکە ئەو قسە و گوفتارانەی کە ڕێگا بۆ ناسینی ئەو خۆش ناکەن، زۆر وتن و دەم بادانێکی بێ سوود و ئاکامە!

نعم! صدقت أي جامي:

هو المطلوب.. هو المحبوب.. هو المقصود.. هو المعبود.

بەڵێ، ئەی جامی! ڕاستت فەرمووە: داواکراوی ڕاستەقینە و.. خۆشەویستراوی ڕاستەقینە و.. ئامانجی ڕاستەقینە و.. پەرستراوی ڕاستەقینە.. هەر تەنها ئەوە!

که "لا إله إلاّ هو" برابر میزند عالم.

چونکە سەرجەمی ئەم جیهانە وەك ئەڵقەیەکی زیکر وایە، کە بە چەندەها زمانی جیا جیا و ئاوازی جۆراوجۆر "لا إله إلاّ هو" دووپات دەکاتەوە و شایەتی لەسەر "تەوحید" دەدات.. بەمەش ئەو زامە قووڵە سارێژ دەکات کە ﴿لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾ لە ناخی مرۆڤدا هێنایەوە سۆ، وەك بڵێی خوڵکی هەموو گرۆی مرۆڤ بکات و پێیان بڵێت:

فەرموون دەست لە هەموو خۆشەویستە مەجازی و فانییەکانتان بشۆن و بەرەو خۆشویستراوی هەمیشەیی و باقی بڕۆن و لێ ببڕێن.

---

(١) بڕوانە: (مثنوی هفت اورنگ – اورنگ پنجم – در اثبات واجب الوجود)ی (مەولانای جامی). بەڵام لە سەرچاوەی ناوبراودا شیعرەکە بەم جۆرەیە:

یکی دان و یکی بین و یکی گوی    یکی خواه و یکی خوان و یکی جوی

(وەرگێڕ)

# دوو تابلۆ

**(بیست و پێنج ساڵ پێش ئێستا و[1] لەو کاتەدا کە لە ئەستەمبوولّ لەسەر گردی "یووشەع"ی لێواری بسفۆڕدا بڕیاری تەرکی دنیام دا، چەند هاوەڵێکی ئازیز هاتن بۆ لام تاکو لەو بڕیارەم پەشیمانم بکەنەوە و بۆ حاڵەت و باری یەکەم جارم بمگێڕنەوە! منیش پێم وتن: لێم گەڕێن تا سبەینێ با ئیستیخارەیەکی پەروەردگارم بکەم! بۆ بەیانی ئەم دوو تابلۆیەی خوارەوە بۆ دڵم هاتن، کە هەرچەند بە شێوە و ڕوخسار لە شیعر دەچن، بەڵام شیعر نین. هەر بەو شێوازەش هێشتمنەوە کە هاتنە دڵمەوە و لەبەر ئەو خاتیرە پیرۆزە قەڵەمم تێ نەبردن. پاشان لە کۆتایی وتەی بیست و سێهەمدا دانران و، لەبەر گونجاویی ئەم پلە و مەقامەش هێنرانە ئێرە).**

## تابلۆی یەکەم

(کە وێنەی ڕاستیی دنیایە لە نیگای بینینی گومڕایانەوە)

بۆ لای دنیا بانگم مەکە! من خۆم هاتم و بێ کەڵکی و فەسادی ئەوم دی..

چونکە لەبەر ئەوەی "بێ ئاگایی" تیایدا بوو بە پەردە و نووری "حەق"ی داپۆشی، ئەوا: سەرجەمی بوونەوەرانم بە: "فانی" و "زیانبەخش" هاتە پێش چاو.

گەر دەڵێیت: "بوون". دەڵێم: بەڵێ، ئەو بەرگەشم پۆشی، بەڵام گەلێ گیروگرفتی "نەبوون"م لەو پێناوەدا هاتەڕێ!

گەر دەڵێیت: "ژیان". دەڵێم: تامی ئەویشم نۆشی، بەڵام گیرۆدەی گەلێ سزا و ئازاری سەختی ژیان بووم.. چونکە لەم ژیانەدا:

"مانەوە"ی مرۆڤ بۆ ئەو بەڵایە..

"ژیری" سزایە و "تەمەن" هەوایە..

---

(١) واتە ساڵی ١٩٢٢ز. (وەرگێڕ)

"کەماڵ" فەنایە و.. "کردار" ڕیایە!

تەنانەت نۆشی ئاوات و هیواکانی ئەم ژیانە هەر خۆیان دەبن بە نێشی ئازار و ئەشکەنجەکانی!

"بەیەك شادبوون"یش خودی نەمانە

ئەوەی کە دەردە تۆ پێت دەرمانە!

ڕووناکی‌یەکانی ئەم جۆرە ژین و بیرکردنەوەیەش تاریکستانێکی ڕەش و چڕ بۆ مرۆڤ فەراهەم دەهێنن و خۆشەویستانیش لەم ڕوانگەیەدا بە وێنەی "هەتیوان"ی بێ نەوا لە پێش چاودا دەنوێنن..

ئەو "دەنگانە"ش کە دێنە گوێی مرۆڤ تێکڕا هەواڵی دڵتەزێنی جودایی و لێکدابڕانیان پێیە و، "زیندووان"یش وەك مردووی بێ‌گیان دەردەکەون.

سەرتاپای "زانستەکان"ی ئەم جۆرە ژیان و دنیایە، وەهم و ئەندێشەی بێ بناغەن و.. هەزاران دەرد و زام و بیماریش لە توێی "دانستەکان"ی‌دا حەشار دراون..

"تام و چێژەکان"یشی سەرتاپا دەرد و ئازارن و.. هەزاران جۆری "نەبوون"یش لە دووتوێی تەنها یەك "بوون"دا خۆیان مەڵاس داوە.

ئەگەر دەشڵێیت: ئەدی ئەی "خۆشەویست"؟!

دەڵێم: بەڵێ، "خۆشەویست"یشم دۆزی‌یەوە، بەڵام سەد ئاخ لە دەست جودایی، کە چەندە ئازاری سەخت دەرخواردی مرۆڤ دەدات!

* * *

## تابلۆی دووهەم

(کە وێنەیەکە ئاماژە بۆ ڕاستیی دنیا دەکات بە لای ڕێڕەوانی ڕێی هیدایەتەوە)

هەر ئەوەندەی پەردەی "بێئاگایی" لە بەرچاودا لاچوو، بە ئاشکرا نووری "حەق"م بینی و، دەرکەوت کە:

"بوون" بەڵگەی زاتی ئەوە و.. "ژیان"یش ئاوێنەیەکە "حەق"ی تێدا دەدرەوشێتەوە..

"ژیری"ش کلیلی گەنجینەکەیە و.. "نەمان"یش دەرگای "مانەوە"یە!

بریسکەی "کەماڵ" کوژایەوە.. بەڵام خۆری "جەماڵ" لەو ئاسۆیەوە هەڵهات!

ئیتر دوای ئەوە:

"نەمان" بوو بە خودی "بەیەك شادبوون" و.. "ئازار"یش تام و چێژی خۆش و بەلەزەتی بەرهەم هێنا.

بینیم کە "تەمەن" هەر خودی کردارەکانی مرۆڤە و، تا "ئەبەد"یش ئەو تەمەنە درێژخایەن و بەردەوامە..

"تاریکی"یش توێکڵی سەر ڕووی "ڕووناکی"یە و.. ژیانی ڕاستەقینەش لە "مردن"دایە!

"شتان"م بە هاودەم و دڵدەرەوە و هاوڕاز هاتنە پێشچاو.. "دەنگەکان"یشم بە زیکر و یادی خوای گەورە هاتنە بەر گوێ، چونکە سەرجەمی بوونەوەران سەرگەرمی زیکر و تەسبیحن.

بۆم دەرکەوت کە:

"هەژاری" گەنجینەی "دەوڵەمەندی"یە و.. "هێز"یش لە دووتوێی "بێ دەستەڵاتی" و کۆڵەواریدایە!

گەر خوای گەورەت دۆزیەوە، هەموو شتێك دەبێت بە هی تۆ. بەڵێ، گەر تۆ بەندەی خاوەنی ئەو موڵکانە بیت، ئەوا سەرجەمی موڵکەکانی ئەو دەبن بە موڵکی تۆ! دەنا گەر بەندەی دەروونی خۆت بیت و لە نەفست ڕازی بیت، ئەوا بێ گومان گرفتاری گەلێ بەڵای بێ ژمارە دەبیت و، سزای چەندین ئازاری بێ سنووریش دەچێژیت.

بەڵام گەر بەندەی ڕاستەقینەی خوای گەورە بیت و، بە ڕاستی ئیمانت پێ هێنا، ئەوا فەرموو خاوێنی و بێ گەردییەکی بێ سنوور ببینە و تامی بەختەوەرییەکی لەژمارەبەدەر بنۆشە و بەدەستی بهێنە.

# لالآنەوەیەك!

**(بیست و پێنج ساڵ پێش ئێستا، لە دوای نوێژی عەسری ڕۆژێکی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، قەسیدەی "الأسماء الحسنى"ی شێخی گەیلانیم - قُدس سرّە - خوێندەوە.. حەزم کرد منیش موناجاتێکی هاوچەشنی ئەوەی شێخی گەیلانی بە "ناوە جوانەکان" بنووسم، بەڵام لەبەر ئەوەی لە بەهرەی هۆنین و هەڵبەست نووسین بێ بەشم، هەر ئەم ئەندازەیەم بۆ نووسرا و - بە داخەوە - نەمتوانی تەواوی بکەم.**

**ئەم موناجاتەش خرایە کۆتایی پەیامی "پەنجەرەکان"ەوە، کە مەکتووبی سی و سێهەمە. بەڵام لەبەر گونجاویی ئەم مەقامە، هێنرا بۆ ئێرە).**

# هو الباقي

حكيم القضايا نحن في قبض حكمه
هو الحكم العدل له الأرض والسماء
عليم الخفايا والغيوب في ملكه
هو القادر القيوم له العرش والثرى
لطيف المزايا والنقوش في صنعه
هو الفاطر الودود له الحسن والبهاء
جليل المرايا والشؤون في خلقه
هو الملك القدوس له العز والكبرياء
بديع البرايا نحن من نقش صنعه
هو الدائم الباقي له الملك والبقاء
كريم العطايا نحن من ركب ضيفه
هو الرزاق الكافي له الحمد والثناء

جميل الهدايا نحن من نسج علمه
هو الخالق الوافي له الجود والعطاء
سميع الشكايا والدعاء لخلقه
هو الراحم الشافي له الشكر والثناء
غفور الخطايا والذنوب لعبده
هو الغفار الرحيم له العفو والرضاء
ئەی "نەفس"ە کەم!
تۆش وەك "دڵ"م..
بە ئەشکی گەش
هانا بۆ فریادڕەس بەرە.
بڵێ: من خۆم "فانی"م.. ئیتر "فانی"م ناوێ..
دەستەوسانم.. کۆڵەوارم..
شتی "دەستەوسان"م ناوێ!
"ڕۆح"ی خۆمم بە خواوەندی "ڕەحمان" سپارد..
هیچ کەسێکی دیکەم ناوێ!
بەڵکو تەنها ئەوم دەمەوێ..
"یار"ی باقیی فانی‌نەبووی تاکم دەوێ.
من گەردیلەم..
بەڵام خۆری ئاوانەبووی هەمیشە بێ باکم دەوێ.
خۆم لە خۆمدا: هیچی تەواو هیچم، کەچی:
سەرانسەری بوونەوەری پاکم دەوێ.

* * *

## بەرهەمی سەرنجدانێك
## لە سەوزەڵانیی بارلا و درەختی کاژ و قەتران و عەرعەر و سوورە چنار

**(کە پارچەیەکە لە مەکتووبی یازدەهەم، لەبەر گونجاویی ئەم مەقامە هێنرایە ئێرە)**

**جارێکیان، لە دەمی ڕەهەندەییم لە "بارلا"دا، لەسەر لوتکەی چیایەکەوە سەیری درەختی کاژ و قەتران و عەرعەرم دەکرد، کە هەموو لایەکی ئەو دەوروبەرەیان داپۆشیبوو، سەرنجی بارودۆخ و ناوازەیی شێوە و دیمەنیانم دەدا.. کتوپڕ سروەیەکی لەسەرخۆ و نیان لەراندنیەوە و ئەو دۆخە کپ و ئارام و بەسام و شکۆیەی ئەوانی گۆڕی و خستنیە کۆڕێکی زیکر و تەسبیح و تەهلیل و، حاڵ و جەزبەی شەوق و شادیەوە. بینیم سەرتاپای ئەو دیمەنە قەشەنگ و ڕەنگینەی کە شادمانیی ئاوێزان بووە، دەرسی پەند و ئامۆژگاریی لێ دەچۆڕێت و دانایی بە گوێی مرۆڤدا دەچرپێنێت. یەکسەر لەو دیمەنەوە، ئەم بڕگە کوردیەی خوارەوەی شێخ ئەحمەدی جزیریم[1] هاتەوە یاد کە دەڵێت:**

هەرکەس بتەماشاگەهی حوسنا تە ژ هەر جا
تەشبیهی نیگاران ب جەمالا تە دنازن[2]

واتە هەموان، لە هەموو لایەکەوە، بە پەلە بۆ بینینی جوانیی تۆ هاتوون و، شانازی بەو جوانییەی تۆوە دەکەن!

جا بۆ دەربڕینی واتاکانی ئەو ئامۆژگاری و پەندانەی کە لەو دیمەنەوە هەستم پێ کرد، "دڵ"م بەم شێوەیەی خوارەوە دایە پڕمەی گریان:

---

(١) شێخ ئەحمەدی جزیری بە "مەلای جزیری" بەناوبانگە و خەڵکی جزیرەی بۆتانە. مێژوونووسانی ئەدەبی کوردی هێشتا بە تەواوی بۆیان ساغ نەبووەتەوە کە ئایا لە سەدەی شەشەم یان نۆهەمی کۆچیدا ژیاوە؟ دیوانەکەی گەلێ جار چاپ کراوە. پوختەترینیان تا ئێستا ئەو چاپەیە کە مامۆستا هەژاری موکریانی - خوا لێی خۆش بێت - بە لێکدانەوەی تێر و تەسەلی خۆیەوە چاپی کردووە، چەند پێشەکی و سەرەتایەکی بەسوودیشی بۆ نووسیوە. بروانە: (دیوانی عارفی ڕەببانی شێخ ئەحمەدی جزیری مەشهوور بە مەلای جزیری) شەرح و لێکدانەوەی هەژار چ/ سرووش - تاران ١٣٦١ هەتاوی. (وەرگێڕ)

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧٦. (وەرگێڕ)

یا رب! [١]

هر حی به تماشاگه صُنع تو ز هر جای به تازی..

زنشیب از فرازی، مانند دلان به ندائی.. به آوازی..

دم دم ز جمال نقش تو در رقصبازی..

ز کمال صنع تو خوش خوش بگازی..

ز شیرینی آواز خود هی هی دنازی..

از وی رقص آمد جذبه خوازی..

ازین آثار رحمت یافت هر حی درس تسبیح نمازی..

ایستاده است هر یکی بر سنك بالا سر فرازی..

دراز کرده است دستهارا به درگاه الهی همچو شهبازی..

به جنبید است زلفهارا به شوق انگیز شهنازی..

به بالا میزنند از بردَهای "های هوی": عیشق بازی..

میدهد "هوشه" گیرینهای درینهای زوالی از حب مجازی..

بر سر محمودها نغمه‌های حزن انگیز أیازی..

مُرده‌هارا نغمه‌های ازلی از حزن أنگیز نوازی..

"روحه" می‌آید ازو زمزمهء ناز و نیازی..

"قلب" می‌خواند ازین آیاتها: سر توحید ز علو نظم إعجازی..

"نفس" می‌خواند درین ولوله‌ها.. زمزمه‌ها: ذوق باقی در فنای دنیابازی..

"عقل" می‌بیند ازین زمزمه‌ها.. دمدمه‌ها: نظم خلقت، نقش حکمت، کنـــز رازی..

آرزو میدارد "هوا" ازین همهمه‌ها، هوهوها: مرگ خود در ترك اذواق مجازی..

"خیال" بیند ازین اشجار: ملائك را جسد آمد سماوی با هزاران نـــی..

ازین "نـــی"ها شنیدت "هوش": ستایشهای ذات حی..

ورقهارا زبان دارند.. همه هو هو ذکر دارند به در معنای حی حی..

چو "لا إله إلاّ هو" برابر میزنند هر شی..

دمادم جویدند: "یا حق".. سراسر گویدند: "یاحی"

برابر میزنند: "الله".

---

(١) ئەم لاڵانەوە فارسی‌یە هەندێ وشەی کوردی و تورکیشی تێکەڵ بووە. (وەرگێڕ)

واتە: ئەی پەروەردگارم!

هەموو زیندەوەرێك لـە گشـت شـوێنێكدا، پێكـەوە، بـۆ جـوانیـی تـۆ دەڕوانـن و، سـەرنجی تیژامان ئاراستەی دیمەنە ناوازەكانی گۆی زەوی دەكەن، كە پیشانگای سنعەتی نایابی تۆیە.

هەموو یەكێك لەو زیندەوەرانە، بە وێنەی دەلاڵ و بانگەوازكار، لە هەموو جێگایـەكدا.. لـە زەوی.. لە ئاسمانە بلندەكاندا، دەنگیان لـێ هەڵبڕیوە و لـە بارەی جوانیـی تـۆوە دەدوێـن و، بینەران و سەرنجدەرانی پێ ئاشنا دەكەن.

ئەم درەختانەش، كە هەندێكن لەو دەلاڵ و بانگەوازكارانە، لە خۆشی و مەستیی جوانیـی نەخش و نیگارەكانت بەسـەر ڕوخسـاری بوونـەوەرەوە، كەوتوونەتـە لەنجـەولار و، جەزبـەی شادمانییان لـێ هاتووە و..

لـە ئـەنجامی بینینـی كـەماڵی سـنعەتی تـۆوە، چـەندین ئـاوازی زیكـر و زایەڵـەی نـەرمونیان دەردەبڕن و بە گوێی ئێمەیدا دەدەن.. دەڵێی دەنگخۆشیی زایەڵەی ئاوازەكانیان، پتر مەستی كردوون و بە لەنجەولاری نازەوە هەموویانی هێناوەتە سەما. هەر بۆیە، بۆ سەما و لەنجـەولاری ئاوا، ڕاپەڕیون و ئارەزووی مەستی و جەزبەش كەمەندكێشی كردوون.

هـەموو زیندەوەرێـك ئیلـهامی نوێـژ و تەسبیحاتی تایبـەتیی خـۆی لـە ئاسـەوارەكانی ئـەم میهرەبانییە تایبەتەوە وەردەگرێت.

پاش خوێندن و وەرگرتنی ئـەو دەرسـە ڕەوانـە، یـەك بـە یـەكی ئـەو درەختانـە لەسـەر تاشـە بەردێكی ڕەق ڕادەوەستێت و دەستەكانی ڕووەو عەرشی مەزن ڕادەگرێت..

نابینیت هەموویان پۆشاكی بەندایەتییان پۆشیوە و، لـە بـەردەم دەرگانـەی خـوای مـەزندا دەستەكانیان بە لالانەوەی گەرمی بەكوڵ هەڵبڕیوە، دەڵێی: "شابازی قەلەندەر"ن؟![1]

پەلـە ناسكەكانیشـیان بـە وێنـەی پەلكـە جـوان و دلڕفێنـەكانی "شـاناز"[2] دەلـەرێنـەوە و، چەندەها تاسەی ناسك و چێژی بەرز و بڵند لە بینەراندا دەورووژێنن؟!

دەڵێی ئەم جوانییە بەجارێ سەرجەمی چینەكانی عیشـق دەخرۆشـێنێت.. تەنانـەت پەنجـە ناسك و نیانەكانیشی بەسەر قوولترینی ژێ هەستیارەكانی مرۆڤدا دەهێنێت!

ئەم بارودۆخە سەرنجبزوێنەی درەختەكان، واتای وەك ئەمـەی خـوارەوە بـە بـیری مرۆڤـدا دەهێنێت:

دیمەنی ئاوا، پەژارەیەكی خەمناك دەخاتـەوە یـاد و.. گریـانێكی تـاڵیش لـە قووڵایـی نـاخی مرۆڤدا هەڵدەقوڵێنێت. ئەو ناخەی كە بە ئازاری نەمانی خۆشەویستە مەجازییەكان، هەردەم دێنەوە سۆ و پتر دەكوڵێنەوە.

---

(١) خزمەتگوزاری شێخ عەبدولقادری گەیلانی بووە و، هـەر لەسـەر دەسـتی ئەویشـدا پێ گەیشـتووە و بـە پلـەكانی ویلایەتدا سەركەوتووە. (دانەر)

(٢) كیژێك بووە كە بە جوانیی خۆی و قژ و پەرچەمی بەناوبانگ بووە. (دانەر)

ئەو دیمەنە، ئاوازی جودایی و ئازاری بەسوێ بە گوێی عاشقاندا دەدات، ئەوانەی کە بە وێنەی لێکدابڕانی سوڵتان مەحموود لە "ئەیاز"ی خۆشەویستی، لە دڵخوازەکانیان دابڕاون!

ئەم درەختانە، بە ئاوازە خەمناك و ناسکەکانیان، دەڵێی زایەڵەی "نەمری" بە گوێی ئەو مردووانەدا دەدەن کە لە گفتوگۆ و لێدوانی دنیا بڕاون.

"گیان"یش لەم دیمەنانەوە تێ گەیشت کە: سەرجەمی شتان، بە تەسبیح و تەهلیل و زیکرەوە، ڕوویان لە درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری مەزن کردووە. کەواتە ئەو دەنگانەی لێیان دەبیسترێت: دەنگ و زایەڵەی لاڵانەوەکانیانە.

"دڵ"یش، لە ناوەندی هۆنینەوە بەرز و بڵندەکەی ئەم ئیعجازە ناوازەیەدا، نهێنیی "تەوحید" لەسەر ڕوخساری ئەو درەختانەدا دەخوێنێتەوە، کە دەڵێی هەریەکەیان ئایەتێکی بەرجەستەی قورئانی پیرۆزن..

واتە: هێندە ڕێسای دەراسا و.. سنعەتی ناوازە و.. ئیعجازی حیکمەت لە بەدیهێنانی هەریەکەیاندا دەبینیت کە ئەگەر سەرجەم هۆکارەکانی گەردوون کۆ ببنەوە و خاوەن ویست و ئیختیار و تواناش بن، ئنجا ناتوانن لاساییان بکەنەوە و هاووێنەیان بەدیبهێنن!

"نەفس"یش کە هەموو جارێك ئەم بارودۆخە لە درەختەکاندا دەبینێت، "بوونەوەر" وا دێتە پێش چاوی کە: لە بەردەم تەوژمی گێژاوی بەخوڕەمی زەمان و جوداییدا تەپاوتلی پێ کەوتبێت!

بۆیە، لەتاوا، کەوتە گەڕان و پشکنین و، خولیای دۆزینەوەی چێژێکی نەبڕاوەی هەمیشەیی کەوتە سەر، تا لە ئەنجامدا ئەم واتایەی پێ ڕاگەیەنرا کە: "بە وازهێنانت لە دنیاپەرستی، مانەوەت دەستگیر دەبێت"!

"عەقڵ"یش: ڕێکوپێکیی بەدیهاتن و.. نەخش و نیگاری حیکمەت و.. گەنجینەکانی چەندەها نهێنیی مەزنی لە توێی:

ئەم دەنگە ناسك و ئارامانەی درەختەکان و سەرجەمی زیندەوەران و.. ئاورنگی ڕووەکە وردیلەکان و..شنەی سروەی هەوا فێنکەکاندا.. بەدی کرد!

لەوەش تێ گەیشت کە هەرچی شت هەیە، بە چەندین لایەن و ڕوو، تەسبیحاتی خۆی بۆ بەدیهێنەری مەزنی ڕادەگەیەنێت!

سەبارەت بە "ئارەزووی نەفس"یش، ئەوا چێژێکی هێندە ناسك لە خشەی گەڵاکان و هەڵکردنی سروە نیانەکان هەست پێ دەکات کە سەرتاپای چێژە مەجازییەکانی لە بیر دەباتەوە، تەنانەت هێندە تام و چێژ لەو دیمەنە وەردەگرێت کە پڕ بە دڵ حەز دەکات دەست لەو تام و چێژە مەجازییانە هەڵبگرێت - کە جەوهەری ژیانی ئەون - و لە پێناوی ئەو چێژە حەقیقییانەدا بمرێت و بتوێتەوە!

"ئەندێشـە"ی مرۆڤیـش، ئـەم دیمەنـەی وا دێتـە بـەرچاو کـە: وەك بلێـی مەلائیکـەتانی سەرپەرشتیکاری ئەم درەختانە، ڕۆشـتبنە نـاو قـەد و ڕەگـەکانیان و پۆشـاکی لـق و پەلـە قامیشییە جۆراوجۆرەکانی ئەوانیان پۆشیبێت! دەڵێی پادشای ئەزەل لەگەڵ ئـاوازی سـەدان شمشاڵ و لـە نـاوەندی نمایشـێکی بەسام و شکۆدا جەستەی ئەم درەختانـەی بە بەری ئەوان پۆشیوە! تـاکو درەختـەکان بـە هەسـت و شـعوورێکی تـەواو - نـەك لـە شـێوەی چـەند جەستەیەکی ڕەقی بێ گیـان و هەستدا - شوکرانە و منەتباریی خۆیـان پێشکەشـی خـوای میهرەبان بکەن!

ئەو شمشـاڵانە، چـەند ئـاوازێکی هێنـدە ناسـك و بێ گـەرد و کاریگـەر دەردەکـەن دەڵێـی سیمفۆنیایەکی ئاسمانین و لە مۆسیقایەکی بڵند و بـەرزەوە دەرچوون! ئـەوەتا بیری مـرۆڤ تـا گوێیـان لـێ ڕابگرێـت، هـەرگیز سـکاڵای جوداییـان لـێ نابیسـتێت، وەك ئـەو ناڵـەی جوداییەی کە سەرجەمی عاشقان، لە پێشەنگیانەوە "مەولانای ڕۆمی" لێیان دەبیستن(١)..

بەڵکو چەندەها جۆری شوکر و ستایشی نیعمەتبەخشی میهرەبانیان لـێ دەبیسـتێت کـە پێشکەشی خواوەندی "حي" و "قیوم"ی دەکەن!

لە کاتێکدا کە درەختەکان بوون بە جەستەی فریشتەی سەرپەرشتیکاریان، گەڵاکانیشـان وەك "زمـان"یـان لـێ هـات و، تەنـها بە هـەڵکردنی سـروەیەکی ناسـك، بە هـەزاران زمـان، زیکـری: "هـو.. هـو"یـان دووپـات دەکـردەوە و.. بـە "ژیـان"ەکەشـیان سـڵاوی خۆیـان بـۆ بەدیهێنەری "حي" و "قیوم" ڕاگەیاند.

چونکە سەرانسـەری بوونـەوەران لـە نـاوەندی ئەڵقەیەکی مـەزنی زیکـردا کـار دەکـەن و پێکەوە و بە یەك دەنگ دەڵێن: "لا إله إلا هو".

هەریەکەشیان، بە زمانی توانسـت و لێـهاتنی سروشتیی خۆی، لـە دەرگانـەی گەنجینـەی میهرەبانیی خوای گەورەدا، دەستەکانی هەڵبڕیوە و، بە دووپـات کردنـەوەی "یـا حـق" داوای مافی ژیان دەکات و.. بە زمانی: "بەدەسـتهێنانی ئـەو ژیانـەش" هـەموویان زیکـری ناوی: "یـا حي" بە بەردەوامی دەڵێنەوە!

فیا حي ویا قیوم! بحق اسم: "حي و قیوم":
حیاتی ده به این قلب پریشان را..
استقامت ده به این عقل مشوش را.
آمین.

---

(١) ئاماژەیە بۆ یەکەم بەیتی "مەسنەویی مەعنەوی"ی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی، کە دەڵێت:
بشنو از نی چون حکایت می کند　　از جداییها شکایت می کند. (وەرگێڕ)

# نامەیەك

## گوفتاری ئەستێرەكان دەردەبڕێت

جارێكیان لەسەر لوتكەیەك لە لوتكەكانی چیای "چام"ەوە و لە ئارامیی شەودا سەیری ڕووی گەشی ئاسمانم دەكرد. كتوپڕ ئەم بڕگانەی خوارەوە بۆ دڵم هاتن. وەك بڵێی ئەندێشەم گوێی لەو گوفتارانە بووبێت كە ئەستێرەكان بە زمانی حاڵ دەریاندەبڕی! ئنجا لەبەر نەشارەزاییم لە ڕێسا و دەستوورەكانی شیعر نووسیندا، ئەو واتایانەم چۆن بە دڵدا هات هەروەهاش نووسیمنەوە، بێ ئەوەی بتوانم لەسەر كێشی شیعر و هۆنین ڕێكیان بخەم.

ئەم بڕگانەش لە مەكتووبی چوارەم و كۆتایی هەڵوێستی یەكەمی وتەی سی‌و دووهەمەوە، هێنران بۆ ئێرە:

گوێ بۆ وتاری بەتام و شیرینی ئەستێرەكانیش ڕابگرە..
با بزانیت كە: مۆری حیكمەتی نەخشاوی سەر ڕوخساری "بوون" چیی بڕیار داوە!

* * *

دەبینیت: هەموویان پێكەوە لەسەر زمانی "حەق" دەدوێن و، بە یەك دەنگ دەڵێن:
ئێمە بەڵگەی ڕوونی درەخشانین لەسەر سام و هەیبەتی خواوەندی بەتوانای شكۆمەند.

* * *

ئێمە شایەتی ڕاستین لەسەر "بوون" و "تەنیایی" و "توانست"ی بەدیهێنەری مەزن..
بە چەشنی مەلائیكەت، تەماشای ئەو موعجیزاتە خنجیلە و ناسكۆڵانە دەكەین كە ڕووی زەوی‌یان ئارایشت داوە.

* * *

ئێمە هەزاران چاوی بینەرین كە لە ئاسمانەوە بەسەر ڕووی زەوی‌دا دەڕوانین و، سەیری بەهەشت دەكەین[1].

---

(١) واتە: ڕووی زەوی شەتڵگا و كێڵگەی بەهەشتە، موعجیزاتی بێ‌سنووری توانستی خوای گەورەی تێدا پێش‌چاو دەخرێت. جا هەروەك مەلائیكەتانی ناو جیهانی ئاسمانەكان تەماشای گۆی زەوی دەكەن و ئەو موعجیزاتانەی تێدا دەبینن، ئەو ئەستێرانەش، كە وەك چاوی ئاسمانەكان وان، بە هەمان جۆرن، چونكە بە چەشنی

هەزاران بەری ڕەنگینی درەختی بەدیهاتووانین کە دەستی دانستی خواوەندی شکۆمەند و خاوەنی جوانی بە ئاسمان و لق و پەلەکانی ڕێی کاکێشاندا هەڵی واسیوین.

* * *

ئێمە بریتیین لە چەند مزگەوت و خانە و لانەیەکی گەڕۆك و بڵند و، چەند گڵۆپێکی ڕووناکیبەخش و، چەندەها کەشتی و فڕۆکەی گەورە بۆ ئاسمان نشینان.

* * *

ئێمە موعجیزەی توانستی بەتوانایەکی خاوەن کەماڵ و.. کاری دەراسا(خارق)ی سنعەتی دانایەکی شکۆمەندین و..

دانایی نایاب و.. بەدیهاتووانی گەورە و گرنگ و.. چەندەها جیهانی ڕووناکیمان لە ئامێز گرتووە!

* * *

بەم جۆرە دەرکەوت کە: ئێمە بە هەزار و یەك زمان، هەزار و یەك بەڵگە بەرچاو دەخەین و دەیاندەین بە گوێی کەسانێکدا کە مرۆڤی ڕاستەقینەن.

دەك چاوی بابای مولحید کوێر بێت، کە ڕووی ڕووناکی ئێمە نابینێت و، گوفتارە ڕوون و ڕەوانەکانمان نابیستێت!.. ئێمە چەند بەڵگەیەکی ڕاست و ڕەواین کە "حەق" لەسەر زارمان دەردەچێت.

* * *

سکە و مۆری هەموومان هەر یەکێکە و.. تێکڕا تەسبیحاتگوزار و بەندەی پەروەردگارمانین و لە ژێر فەرمانی ئەودایین.

ئێمە بەدەم جەزبەی خۆشەویستیی خوای گەورەوە یاد و زیکری ئەو دەکەین و، هاوبەشی ئەڵقەی زیکری ڕێی کاکێشانین!

---

مەلائیکەتان تەماشای بەدیهاتووە ناسکۆلەکانی گۆی زەوی دەکەن و، لە هەمان کاتدا بۆ جیهانی بەهەشتیش دەڕوانن و، کارە دەراسا و کاتییەکانی ئێرە لە شێوە باقی و هەمیشەییەکانی ئەوێدا دەبینن. واتە ئەو ئەستێرانە لەو کاتەدا کە تەماشای گۆی زەوی دەکەن، بە ڕوانینێکی تر، ئاوڕیش لە بەهەشت دەدەنەوە، واتە چاویان لە هەردوو جیهانەکەیە. (دانەر)

# وتەی هەژدەهەم

(ئەم وتەیە دوو مەقامە و، هێشتا مەقامی دووهەمی نەنووسراوە. یەکەمیشیان بریتی‌یە لە سێ خاڵ)

## ● خاڵی یەکەم:

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿لا تَحْسَبَنَّ الّذينَ يفرحونَ بما أتَوْا و يُحِبُّونَ أن يُحْمَدُوا بما لَمْ يَفعلوا فلا تَحْسَبَنَّهم بِمَفازَةٍ من العذابِ ولهم عذابٌ أليم﴾ (آل عمران:١٨٨)

**زلـلـەیەکی تەمێ کردن لە دەروونی بەدخوازم!**

ئەی نەفسی شەیدای شانازی و ناوبانگ دەرکردن و عەوداڵی مەدح و ستایش!
ئەی نەفسی گومڕام!
ئەگەر "تـۆوی هـەنجیر" کـە هـۆی پەیدابوون و سـەرهەڵدانی هـەزاران بـەری هـەنجیرە و.. قەدی ڕەق و لاوازی "مێو"یش کە سەدان هێشووی پێدا شۆڕ بوونەتەوە، هەر بۆ خۆیـان و بـە ڕێی کارامـەیی و توانستی خۆیانـەوە ئەو بـەر و هێشـووانەیان بـەدی هێنـابێت، ئـەوا دەبـێ هەر کەسێك سـوودێکی لـەو ئاکامانـەوە دەسـت کەوتبێت سـوپاس و سـتایش پێشـکەش بـەو تۆوی هەنجیرە و بەو مێوە بکات!
جا ئەگەر ئەم قسەیە ڕەوا بێت، ئەوا تۆیش – ئەی نەفسەکەم! – لەوانەیە مـافی شـانازی و لەخۆبایی‌بوونت بۆ بڕەخسێت سەبارەت بەو نیعمەتانەی کە لە کۆڵت نراون!
کەچی تۆ – لە ڕاسـتی‌دا – جگـە لـە زەمکـردن شـایانی چیی‌تر نیـت! چونکـە لەبـەر ئـەو جوزئی ئیختیاری‌یـەی لـە خۆتـدا شـکی دەبـەیت، هێشتا وەك قـەد و تۆوەکـەش دەرنـاچیت! کەواتە تـۆ بـەم شـانازی و لەخۆبایی‌بوونـەت لـە نرخـی ئـەو نیعمەتانـە دادەشـکێنیت و مافیـ ـ پێشێل دەکەیت. تەنانـەت بـە سپڵەیی و پێنـەزانی و پشـت گوێ خسـتنی شـوکرانەبژێری. لەوەیان دەردەکەیت کە بە نیعمەتیان بزانیت و، بەوەش کە خۆت بە خاوەنیان دادەنێـت، لـە خاوەنی ڕاستەقینەی خۆت زەوتیان دەکەیت!

تۆ دەبێ لە هەڵوێستێکی ئاوەهادا شوکرانە پێشکەش بکەیت، نەك فەخر و شانازی بنوێنیت.. تەوازوع و شەرم شایانی تۆیە، نەك ناوبانگ.. دەبێ هەردەم داوای لێبوردن لە خواوەند بکەیت و هەمیشە لە پەشیمانیدا بیت، نەك بچیت بە مەدح و ستایشی خۆتەوە خۆت سەرقاڵ بکەیت.. دەبێ بزانیت کەماڵی تۆ لە "خۆویستی"دا نییە، بەڵکو لە هەنگاوناندایە بەپێی ڕێنمایی قورئان.

بەڵێ ئەی نەفسەکەم! تۆ لە جەستەی مندا وەك "سروشت" وایت لە جیهاندا! هەردووکتان(نەفس و سروشت) بۆ ئەوە بەدی هێنراون کە شایانی "ئەنجامدانی خێر" و مەرجەعی "شەڕ" و "خراپکاری"یەکان بن.

واتە ئێوە – هیچ کامتان – بکەر(فاعل) و چاوگ(مصدر) نین، بەڵکو "کارتێکراو"ن و شوێنی تیا ئەنجامدانی کارن. ئێوە تەنها یەك کاریگەریتان هەیە کە لەوەدایە دەبن بە هۆکاری پەیدابوونی "شەڕ" و "خراپکاری‌یەکان" کاتێ کە بە ڕێکوپێکی و جوانی و شایستەیی، ئەو "خێر"ە وەرناگرن کە لە لایەن "خێری موتڵەق"ەوە – کە خوای گەورەیە – دێتە ڕێتان!

پاشان ئێوە وەك دوو "پەردە"ی ئەوتۆ بەدی هێنراون کە خراپە و ناشیرینی‌یە ڕواڵەتی‌یەکانی ئەو شتانەتان بدرێتە پاڵ کە ڕووی جوانی‌یان نابینرێت، تاکو ببن بە دوو هۆکاری پاك ڕاگرتن و تەنزیهی زاتی مەزنی خوای گەورە. کەچی ئێوە – واتە: نەفس و سروشت – شێوەیەکتان گرتەخۆ کە پێچەوانەی ئەم کارمەندی‌یە سروشتی و ئەرکەی سەر شانتانە. ئەوەتا لەبەر ئەوەی بۆ خۆتان خاوەنی توانا و قابیللییەت نین، ئەوا دەچن "خێر" دەگۆڕن بە "شەڕ" وەك بڵێی هاوبەشی کردارەکانی بەدیهێنەرتان بن!

کەواتە ئەو مرۆڤەی کە "دەروون" یاخود "سروشت" دەپەرستێت، لەوپەڕی نەفامی و ستەمکاری‌دایە!

لەبەر ئەوە، ئەی نەفسەکەم!

هەرگیز نەڵێیت: (من جێی دەرکەوتنی جوانیی خواوەندم، کەواتە هەرکەسێك شتێکی لەو جوانی‌یەوە دەست بکەوێت، ئەویش بە "جوان" دادەنرێت)..

نەخێر وا مەڵێ، چونکە تۆ بە تەواوی ئەو "جوانی"یەت دەرنەخستووە، کەواتە نابیت بە جێی دەرکەوتن(مەزهەر)ی ئەو جوانی‌یە، بەڵکو تەنها ڕێگایەکیت بۆ پێدا ڕۆشتن و گوزەر کردنی.

هەروەها نەشڵێیت:

لە نێوان هەموو خەڵکیدا من هەڵبژێرراوم و ئەم بەروبوومانە بەهۆی منەوە دەردەکەون. بەو واتایەی کە بڵێیت: من فەزڵ و تایبەتکاری‌یەکی جیاوازم هەیە.. نەخێر، نەخێر، تۆ ئەو

به‌روبوومانه‌ت له‌به‌ر ئه‌وه دراونه‌تێ كه له هه‌موو كه‌سێك زیاتر پێویستیت پێیانه و، له هه‌موو شیان پتر موفلیس و ده‌ست كورتیت و، خاوه‌نی ئێش و ئازاری زیاتریت[١].

## ● خاڵی دووهه‌م:

وا یه‌كێك له نهێنی‌یه‌كانی ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه ڕوون ده‌كه‌ینه‌وه:

﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ﴾ (السجدة:٧).

به‌ڵێ، هه‌موو شتێك له‌ناو ئه‌م بوونه‌وه‌ره‌دا، ته‌نانه‌ت ئه‌و شتانه‌ش كه به چاوی ڕواڵه‌تبین به ناشیرین‌ترینی شتان داده‌نرێن، ئه‌وپه‌ڕی "جوانی"یان تێدایه! هه‌موو شت و ڕووداوێكی ناو ئه‌م گه‌ردوونه، چ هه‌ر له خۆیدا و چ به‌هۆی غه‌یری خۆیه‌وه، واته به‌و ئه‌نجامانه‌ی به‌رهه‌میان ده‌هێنێت، به جوان داده‌نرێت..

گه‌لێ ڕووداو هه‌ن كه به ڕواڵه‌ت "ناشیرین" و "ئاڵۆز" و "شڵه‌ژاو" ده‌رده‌كه‌ون، به‌ڵام له پشتی ئه‌و په‌رده ڕواڵه‌تی‌یه‌وه گه‌لێ جۆری "جوانی"ی ناوازه و "ڕێسا"ی ورد دانراون كه چاوی ڕواڵه‌ت بین ناتوانێت بیانبینێت.

بۆ نموونه: له پشت په‌رده‌ی قوڕ و تۆز و زریان و بارانی به‌لێزمه و تۆفی به‌هاره‌وه: زه‌رده‌خه‌نه‌ی گوڵانی ڕه‌نگین و له‌نجه‌ولاری ڕووه‌ك و نه‌مامه جوان و به گوڵ خه‌ملاوه‌كان حه‌شار دراون!

هه‌روه‌ها له ناوه‌ندی زریانه ڕووخێنه‌ره‌كانی وه‌رزی پایزدا كه دره‌خت و ڕووه‌ك له بێخ ده‌رده‌هێنن و گه‌ڵا سه‌وزه‌كان له‌سه‌ر لقه‌كانیان ڕاده‌چڵه‌كێنن و هه‌ڕه‌شه‌ی جودایی‌یان له‌گه‌ڵ خۆدا هێناوه و ئاوازی خه‌م و په‌ژاره و مردن و نه‌مان لێ ده‌ده‌ن.. له نێوان ئه‌مه‌دا، مژده‌ی ڕزگاربوون له ئه‌ركی قورسی "كارگوزاری" بۆ ملیۆنه‌ها مێرووی ورد و ناسك و لاواز حه‌شار دراوه كه له ده‌می پشكووتنی گوڵانی به‌هاردا ژیانیان تێدا ده‌بووژێته‌وه. به‌م چه‌شنه و به‌هۆی ئه‌م له‌سه‌ر كار لابردنه، مێرووه لاوازه‌كان له ده‌ست سه‌ختی و پاڵه‌په‌ستۆی سه‌رمای زستان ده‌پارێزرێن. جگه له‌مانه‌ش، "كه‌ش"ی سه‌خت و خه‌مناكی زستان ڕووی زه‌وی بۆ پێشوازیی به‌هاری ڕه‌نگین ئاماده ده‌كات!

به‌ڵێ، له پشت په‌رده‌ی: زریان و بوومه‌له‌رزه و بڵاوبوونه‌وه‌ی نه‌خۆشی‌یه‌كانه‌وه، گه‌لێ گوڵی مه‌عنه‌وی ده‌پشكوون. چونكه "تۆو" و "ناوك"ی توانا و لێهاتنه په‌نهانه‌كان - كه هێشتا گوڵیان نه‌گرتووه - له ئه‌نجامی چه‌ند ڕووداوێك گوڵ ده‌گرن كه به ڕواڵه‌ت "ناشیرین" دێنه پێش‌چاو، به ڕاده‌یه‌ك كه ئه‌و ئاڵوگۆڕه گشتی‌یانه‌ی له بوونه‌وه‌ردا ڕوو ده‌ده‌ن - له ڕاستیدا -

---

(١) به ڕاستی ئه‌م سه‌ركه‌وتنه‌ی "سه‌عیدی نوێ"م له‌م گفتوگۆیه‌دا گه‌لێ به دڵه كه تا ئه‌م ڕاده‌یه "ده‌روون"ی خۆی ده‌مكوت كرد. بۆیه پیرۆزبایم پێشكه‌ش كرد و پێم وت: "هه‌زار جار بارك الله". (دانه‌ر)

چەند بارانێکی مەعنەوین بەسەر تۆوی توانا و لێهاتنەکاندا دەبارێن تاکو دەمیان بە گوڵ بپشکوێت!

بەڵام مرۆڤی شەیدا و دەستبەردار نەبووی ڕواڵەت، کە تەنها لە ڕوانگەی خۆویستی و بەرژەوەندیی زاتی خۆیەوە دەڕوانێتە کاروبار و ڕووداوەکان، تەنها ڕواڵەتەکان دەبینێت و هەر لەو ڕوانگەیەشەوە بڕیاری "ناشیرینی"یان لەسەر دەردەکات!

هەروەها لەبەر ئەوەی مرۆڤ هەموو شتێك بەپێی ئەو ئەنجامانە هەڵدەسەنگێنێت کە ڕوویان لە زاتی خۆیەتی، ئەوا بڕیاری سەبارەت بە زۆربەی شتان وایە کە بە "شەڕ"یان لە قەڵەم بدات. لە کاتێکدا کە ئەگەر ئامانجی شتان یەکێکیان ڕووی لە مرۆڤ بێت، هەزارانیان ڕوویان لە ناوەکانی بەدیهێنەری مەزنیانە..

بۆ نموونە: مرۆڤ لەتاو ئەو درەخت و ڕووەکە دڕکاوی‌یانە بێزاری دەردەبڕێت کە خوێن لە جەستەی دەهێنن کاتێ دەستیان بۆ دەبات و، پێی وایە کە چەند بەدیهاتوویەکی زیانبەخش و بێ سوودن! کەچی ئەو دڕکانە بۆ ڕووەك و درەختەکان لەوپەڕی گرنگی‌دان، ئەوەتا دەبن بە پاسەوانیان و لەو دەستانە دەیانپارێزن کە بە نیازی خراپ بۆیان درێژ دەکرێن!

نموونەیەکی تر: هەڵمەت بردنی "هەڵۆ" بۆ چۆلەکە و باڵندە لاوازەکان بە ڕواڵەت پێچەوانە و دژی سۆز و میهرەبانی‌یە، کەچی لە ڕاستی‌دا دەبێت بەهۆی ئەوەی توانا و لێهاتنی ئەو باڵندانە بۆ فڕین و خۆپاراستن بکەوێتە کار و بە ڕوونی بەرجەستە ببێت، چونکە ئەگەر مەترسیی لەو جۆرەیان لە ڕێ‌دا نەبوایە و هەستیان بە هێرش و پەلاماری باڵندە بەهێزەکان نەکردایە، ئەوا هەرگیز ئەو توانا و لێهاتنانەی ئەوان دەرنەدەکەوتن و لە جێی خۆیاندا دەپووکانەوە.

نموونەیەکی تر: بارینی بەفر - کە لە وەرزی زستاندا هەموو شتێك بە تەواوی دادەپۆشێت - لەوانەیە هەندێ جار مایەی بێزاریی مرۆڤ بێت، چونکە لە تام و لەزەتی "گەرمی" و بینینی دیمەنە سەوزە جوانەکان بێ بەشی دەکات! کەچی لە ناوجەرگەی ئەو سەهۆڵبەندانەدا گەلێ دارستانی گەرموگوڕ و ئەنجام و داهاتی شیرین و بەتام حەشار دراون کە زمانی مرۆڤ لە وەسفیاندا دەستەوسانە.

پاشان مرۆڤ لە گۆشەی ڕوانینە بەرتەسکەکەی خۆیەوە تەنها بەسەر ئەو لایەی شتاندا حوکم دەدات کە ڕوویان لە خۆیەتی. لەبەر ئەوە، باسکردنی زۆربەی ئەو شتانەی کە لە چوارچێوەی "ئەدەب"دان، مرۆڤ پێی وایە لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدان و سنووری "ئەدەب"ی پێ دەشکێت، وەك: باسکردنی "ئەندامی زاوزێ"ی ئادەمیزاد کە لە ناو قسە و گوفتاری مرۆڤدا مایەی شەرمەزاری‌یە. لە ڕاستی‌دا ئەم شەرمەزاری‌یە تەنها لەو لایەدایە کە

ڕووی لـە مرۆڤـە، دەنـا ڕووەكـانی تـری، واتـە لایـەنی: (بەدیـهێنان و، وردەكـاری و، ئـەو ئەنجامانەی لە پێناویاندا بەدی هاتووە) جوان و پڕ لە دانستن، بەم ڕوانینەش دەردەكـەوێت كـە ئەو باسە سەرتاپا ئەدەب و حەیایە و هەرگیز چێژ ز شەرمی مرۆڤی پێ عەیبدار نابێت..

تەنانـەت لـە نێـوان سـوورەتەكانی قورئـانی پیرۆزدا - كـە سـەرچاوەی ئـەدەبی خـاوێن و بێ گەردە - چەند دەستەواژەیەكی ئەوتۆ هەن كە ئاماژەیەكی تەواو نیان و جوان بۆ ئـەم ڕوو: پڕ لە دانست و پەردە ناسكانە دەكەن.

كەواتە ناوەرۆكی ئەو شتانەی كە ئێمەی مرۆڤ لە هـەندێ بوونـەوەردا بـە "ناشـیرین"یـ دەبینین و، ئەو ئـازار و خەم و پەژارانـەش كـە هـەندێ ڕووداوی ڕۆژانـە بـەجێیان دەهێڵـن. گەلێ ڕووی جوان و ئامانج و مەبەستی باش و بەرز و حیكمەتی ڕێنماییان تێدایە و ڕوویـ لە بەدیهێنەری بەخشندەیانە، بەو جۆرەی كە خۆی تەقدیر و ڕێنمایی كردووە و ویستی لەسەر بووە..

زۆر لەو شـتانەی كـە بـە ڕوالـەت تێكـەڵ و نـاڕێك و ئـاڵۆز دێنـە بـەرچاو، گـەر بـە وردی سەرنج لە ناوەرۆكیان بدەین، چەندەها نووسینی پیرۆزی پەروەردگاریانـە و ڕەنگینیـان لـە دووتوێدا دەبینین كە لەوپەڕی "جوانی" و "ڕێكوپێكی" و "خێر" و "دانایی"دان.

● **خاڵی سێهەم:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿**قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ**﴾ (آل عمران: ٣١).

مادەم جوانیـی سنعەت لـە گـەردووندا بـە ئاشكرا هەیـە و لـە بەرچاودایـە، ئـەوا دەبێ بـە ئەندازەی بێ گومانی و دڵنیایی پلەی: شهوود "ڕیسالەتی ئەحمـەدی"یش بچەسپێت. چونكـە جوانیـی سـنعەت و شـێوە و ڕوخسـاری ئـەم بەدیهاتووانـە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی كـە خاوەنەكەیان ویستی وا بووە بەدیـهاتووانی لەوپـەڕی جوانـی و ئارایشـتدا بـن.. ئنجـا ویستی ڕازاندنەوە و جوانكاری و ئارایشتدانیش بەڵگەیە لەسەر ئـەوەی كـە بەدیهێنەرەكـەیان داری خۆشەویستییەكی بـەرز و ئارەزوومەندییـەكی قودسـییە بـۆ دەرخسـتنی كـەماڵاتی سنعەتی خـۆی كـە لـە بەدیـهاتووانیدا داینـاون.. پاشـان ئـەو خۆشەویسـتی و ئارەزوومەندییـە قودسـییەش - بـێ هیـچ گومـانێك - داخـوازی ئـەوەن كـە لـە كاملـترین و ڕووناكـترین بەدیهاتووانی خۆیدا (كە مرۆڤە) بەرجەستە بووبن. چونكە "مرۆڤ" بەری خاوەن هەسـت و شعووری درەختـی گەردوونـە، خـۆ "بـەر"یـش جـەمترین و دوورتریـن بەشـەكانی درەختـە و خاوەنی ڕوانین و هەست و شعوورێكی گشتییە.. ئنجا لەناو گرۆی مرۆڤیشدا تەنها ئەو یەك دانە كەسەی كـە خـاوەنی ڕوانین و هەسـت و شـعووری گشـتییە، شـایانی گفتوگۆ لەگـەڵ كردنی بەدیهێنەری خـاوەن جوانییە و ئامـادەی حـوزووری ئـەوە، چونكـە هـەموو ڕوانیـن و

هەست و شعووره گشتی‌یەکانی خۆی بۆ: پەرستنی بەدیهێنەری مەزن و، بەجوان زانین و نرخ شناسیی سنعەتەکانی و، سوپاسگوزاریی نیعمەتەکانی ئەو، تەرخان دەکات..

کەواتە، بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە ئەو یەك دانە کەسە ناوازه و بێ وێنەیە، قسە بۆکراوی خۆشەویست و نزیکی ئەو بەدیهێنەره دەبێت!

جا ئێستا ئێمە دوو "تابلۆ" و دوو "بازنە"مان لە پێش چاودان:

یەکێکیان: بازنەی "پەروەردگاریتی"یەك لەوپەڕی ڕێکی و جوانی و سام و شکۆدا و، تابلۆیەکیش لەوپەڕی وردەکاری و ناوازەییدا..

ئەوی تریان: بازنەیەکی "بەندایەتی" لەوپەڕی ڕازاوەیی و ڕوونـاکیدا و، تابلۆیەکی سوپاسگوزاری و بەجوان زانین و ئیمانیش لەوپەڕی گشتی‌بوون و فراوانی‌دا، بە ڕادەیەك کە ئەم بازنەی بەندایەتی‌یە، بە هەموو لایەن و ڕووەکانیەوە، بە ناوی بازنەی یەکەمەوە دەجووڵێت و، بە هەموو هێزێکیشیەوە لە پێناوی ئەودا کارەکانی ڕادەپەڕێنێت.

بەپێی ئەمانەی باس کران، بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی دەزانرێت:

سەرکردەی ئەم بازنەیەی کە خزمەتی ئامانجەکانی بەدیهێنەر سەبارەت بە بەدیهاتووانی دەکات، پەیوەندی‌یەکی گەلێ گەرموگوڕ و بەتین و توندوتۆڵی لەگەڵ بەدیهێنەردا هەیە و خۆشەویستی ئەوە و ڕەفتارەکانیشی لای ئەو مایەی ڕەزامەندین.

جا ئایا هیچ "ژیری"یەك هەیە پێی وا بێت کە بەدیهێنەری ئەم دروستکراوانەی کە وا بە چەندەها جۆری "جوانی" ئارایشت دراون و، ئەم هەموو نیعمەتانەی بەسەردا باراندوون و، چاودێریی ناسکترین و وردترینی چێژی ناو دەمی ئەوانی کردووە، بایەخ بەم بەدیهاتووە هەرە کامڵ و تەواو جوانەی خۆی نەدات کە ڕووی پەرستنی تێ‌کردووە و.. لە ڕێی تەهلیل و تەکبیر و ڕێز لێنـان و نرخ شناسیی بەدیهاتوانی ڕەنگینی ئەوەوە، عەرش و فەرشی هەژاندووە و.. بە ئاوازی حەمد و شوکر و تەکبیر لە بەرامبەر نیعمەتەکانی بەدیهێنەری مەزنەوە، دەریا و وشکایی‌یەکانی خستووەتە لەرزە؟

ئایا دەگونجێ ئەو بەدیهێنەرە ڕوو لەو بەدیهاتووەی نەکات؟ یان بە گوفتاری خۆی سرووش(وەحی)ی بۆ نەنێرێت و نەیکات بە ڕەوانەکراوی خۆی؟ یان نەیەوێت ڕەوشتە جوانەکانی ئەم بەدیهاتووەی، لەناو سەرجەم بوونەوەراندا بڵاو ببنەوە؟

نەخێر.. نەخێر.. هەرگیز ناگونجێ گوفتاری خۆی ئاراستە نەکات و پلەی: "پێغەمبەرێتی"ی نەداتێ و، بۆ لای سەرجەم گرۆی ئادەمیزادیش ڕەوانەی نەکات!

﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الإِسلام﴾ (آل عمران:١٩).

﴿محمدٌ رسولُ اللهِ والَّذينَ معَهُ أَشِدَّاءُ على الكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ﴾ (الفتح:٢٩).

#ناڵەی گریانی دڵێکی خەمبار

## لە بەرەبەیانی ڕۆژگارانی جودایی و نامۆیی سەردەمی دیلیدا

لە دەمی سەحەردا سروەی "تەجەللی" هەڵدەکات..

کەواتە ئەی چاوی نوستووم! لەو کاتەدا بێدار بەرەوە و، داوای چاودێری لە خاوەنی خۆت بکە.

چونکە دەمی سەحەر: کاتی تۆبە و پەشیمانیی گوناهبارانە..

دەسا تۆیش - ئەی دڵی گوناهبارم! - ڕاپەڕە و، پەشیمانی دەربڕە و، لە دەرگانەی خاوەنەکەتدا داوای لێبوردن بکە.

سحر حشریست، درو هُشیار و در تسبیح همه شی..
بخواب غفلت سرسم نفسم حق کی؟
عمر عصریست سفر با قبر می‌باید ز هر حی..
بپرخیز نمازی چو "نیازی" کو بکن آوازی چون نی..
بگو: یارب!
پشیمانم خجیلم شرمسارم از گناه بی شمارم
پریشانم ذلیلم اشکبارم از حیات بی قرارم
غریبم بی کسم ضعیفم ناتوانم
علیلم عاجزم اختیارم بی اختیارم
"الأمان" گویم، عفو جویم، مدد خواهم ز درگاهت إلهی!

# وتەی نۆزدەهەم

## تایبەتە بە "ڕیسالـەتی ئەحـمەدی"یەوە

ما إنْ مدحْتُ محمداً بمقالتي          لكن مدحتُ مقالتي بمحمد ﷺ!

**بـەڵێ، ئـەم "وتـە"یـە جوانـە، بـەڵام ڕەوشـتەکانی پێغەمبـەر ﷺ کـە لــە سـەرووی "جوانی"یەوەن، جوانی‌یان پێ بەخشیوە!**

**ئەم وتەیە (بریسکەی چواردەهەم) چواردە "نم"ی تێدایە:**

❑ **نمی یەکەم:**

سێ ناسێنەری گەورە هەن کە پەروەردگاری خۆمانمان پێ دەناسێنن:

**یەکەمیان:** پـەڕاوی گەردوونـە، کـە بەشێکمان لـە شایەتی دانـی ئـەم پـەڕاوە بیست، لـەو سیازدە "بریسکە"یەی کە لە "مەسنەویی نووری" (المثنوي العربي النوري)دا باس کران.

**دووهەمیان:** ئایەتی هەرەمەزنی ناو ئەم کتێبە گەورەیەی گەردوونـە، کـە کۆتـایی پێ‌هێنـەری کاروانی پێغەمبەرێتی‌یە ﷺ.

**سێ‌هەمیان:** قورئانی پیرۆزە.

ئێستا دەبێ ئەم بەڵگە دووهەمە گۆیایەی کە دواهەمین و سەرداری هـەموو پێغەمبەرانـە ﷺ بناسین و، بە ئەدەب و ڕێزەوە گوێی لـێ ڕابگرین:

بزانە کە ئەو بەڵگەیە "کەسـێتی‌یەکی مەعنـەوی"ی گـەورەی هەیـە. جـا ئەگـەر پرسیارت کرد و وتت: ئەو بەڵگەیە کێ‌یە و، ماهییەتەکەی چی‌یە؟

ئەوا لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

ئـەوە ئـەو کەسـەیە کـە لـەبەر گـەورەیی مەعنـەویی ئـەو: سـەر ڕووی زەوی بـووە بـە مزگـەوتی و، مەککـە بـە میحرابی و، مەدینـە بـە مینبـەری و، خۆیشـی پێش‌نوێـژی سـەرجەمی ئیمانداراـنە کـە لـە پشتیەوە ڕیزیـان بەستووە و، وتـاربێژی هـەموو مرۆڤایەتی‌یـە و، یاسـاکانی بەختەوەری‌یان بۆ ڕوون دەکاتـەوە و، سـەرووەری گشـت پێغەمبەرانـە، تەزکییـەیان دەکـات و بـەوەش کـە ئایینـەکەی ئـەم سـەرجەم بناغـەکانی هـەموو ئایینـەکانی ئـەوانی لـە خـۆیدا کـۆ

كردووه‌ته‌وه، ئه‌وا ته‌سدیقی هه‌موویان ده‌كات.. ئنجا گه‌وره‌ی هه‌موو ئه‌ولیاكانه، چونكه به‌هۆی ڕووناكیی خۆری پێغه‌مبه‌رێتی‌یه‌كه‌یه‌وه په‌روه‌رده و ڕابه‌ری و ڕێنمایی هه‌موویان ده‌كات.. ئه‌م پێغه‌مبه‌ره ﷺ جه‌مسه‌رێكه له ناوه‌ندی بازنه‌یه‌كی زیكردا كه له پێغه‌مبه‌ران و صیدیقان و پیاوچاكان پێكهاتووه و هه‌موویان به یه‌كده‌نگ ئه‌و وشه‌یه ده‌ڵێنه‌وه كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ پێی ڕاگه‌یاندوون. دره‌ختێكی نوورانیی وه‌هایه كه ڕه‌گ و ڕیشه مه‌حكه‌م و زیندووه‌كانی بریتین له پێغه‌مبه‌ران - علیهم السلام - به‌هۆی ئه‌وه‌ی كه بناغه‌ی بانگه‌كانیان له لایه‌ن خواوه‌نده‌وه‌یه. لق و په‌ل و گه‌ڵا سه‌وز و به‌روبوومه جوان و به‌تامه‌كانیشی ئه‌ولیاكانن، كه به‌هۆی ئه‌و زانیاری‌یانه‌ی له ڕێی ئیلهامه‌وه سه‌باره‌ت به ناسینی خوای گه‌وره ده‌ستیان كه‌وتووه، بوون به لق و په‌ل و به‌ری ئه‌و دره‌خته. كه‌واته ئه‌م پێغه‌مبه‌ره ﷺ هه‌ر ده‌عوایه‌ك بڵێت، هه‌موو پێغه‌مبه‌ران به موعجیزاتیان و، ئه‌ولیاكان به كه‌رامه‌ته‌كانیان تێكڕا و به یه‌كده‌نگ شایه‌تیی بۆ ده‌ده‌ن و ته‌سدیقی ده‌كه‌ن.

بم جۆره، هه‌موو ده‌عوایه‌كی ئه‌م پێغه‌مبه‌ره ﷺ مۆری هه‌موو مرۆڤه كامڵه‌كانی گرۆی مرۆڤایه‌تیی به سه‌ره‌وه‌یه. ئه‌وه‌تا ده‌بینیت كه ئه‌و ده‌فه‌رموێ: "لا إله الا الله" و به‌مه‌ش ده‌عوای "یه‌كتایی" خواوه‌ند ڕاده‌گه‌یه‌نێت، ئه‌وا له لایه‌ن ڕابوردوو و ئاینده و له هه‌ردوو ڕیزه نوورانی‌یه‌كه‌وه، واته له خۆر و ئه‌ستێره‌كانی گرۆی مرۆڤایه‌تی‌یه‌وه كه له بازنه‌ی زیكره‌كه‌دان، هه‌مان وشه ده‌بیستیته‌وه كه هه‌موویان ده‌یڵێنه‌وه و دووپاتی ده‌كه‌نه‌وه و، گشتیان له‌مه‌دا یه‌كیان گرتووه، هه‌رچه‌نده‌ش مه‌شره‌ب و ڕێبازیان له یه‌كتر جیاوازه. وه‌ك بڵێی ئه‌وان بم یه‌كده‌نگی‌یه‌یان بم پێغه‌مبه‌ره ﷺ ده‌ڵێن: "صدقْتَ وبالحق نطقتَ"! ئیتر ئایا چ وه‌هم و خه‌یاڵێك ده‌توانێت بۆ به‌رپه‌رچدانه‌وه‌ی ده‌عوایه‌كی وه‌ها ده‌ست درێژ بكات كه شایه‌تی دانی كه‌سانێكی له‌ژماره‌به‌ده‌ری ئه‌وتۆ پشتی گرتبێت كه موعجیزه و كه‌رامه‌ته‌كانیان ته‌زكییه‌یان بكات؟

❑ نمی دووهه‌م:

بزانه ئه‌م به‌ڵگه نوورانی‌یه‌ی كه بوو به به‌ڵگه له‌سه‌ر "یه‌كتایی" خوا و، ڕێنمایی مرۆڤایه‌تیی بۆ "ته‌وحید" كرد، هه‌روه‌ك به ئه‌ندازه‌ی هێزی ئیجماع و ته‌واتوری هه‌ردوو باڵی "پێغه‌مبه‌رێتی" و "ویلایه‌ت" پشتگیری كراوه، سه‌دان ئاماژه‌ی ناو كتێبه ئاسمانی‌یه‌كانیش، وه‌ك ئه‌و مزگێنی‌یانه‌ی ناو (ته‌ورات و ئینجیل و زه‌بوور و زه‌بووره‌كانی پێشین) ته‌سدیقی ده‌كه‌ن[1].

---

(١) "حسین الجسر" سه‌د و چوارده مزگێنیی له‌و كتێبانه ده‌رهێناوه و له كتێبی "الرسالة الحمیدیة"دا تۆماری كردوون. جا ئه‌گه‌ر دوای ده‌ستكاری و ته‌حریفی ئه‌و كتێبانه تا ئه‌م ڕاده‌یه مزگێنی‌یان تێدا مابێت، ئه‌وا بێ گومان ده‌بێ پێش ده‌ستكاری و ته‌حریف كردنیان مزگێنیی گه‌لێ زیاتریان به ڕاشكاوی تێدا بووبێت! (دانه‌ر)

هەروەها هێمای هەزاران ئیرهاصی زۆر، کە هەموویان بە چاو بینراون، تەسدیقی دەکەن.

هەروەها مژدەدانی چەندین دەنگ(هاتف) و شایەتیدانی موتەواتیری کاهینەکانیش تەسدیقی دەکەن.

هەروەها موعجیزەکانیشی دەبن بە بەڵگەی تەسدیقی ئەو. وەك موعجیزەی: لەتبوونی مانگ و، هەڵقوڵانی ئاو بە وێنەی کەوسەر لە نێوان پەنجەکانی و، هاتنی درەخت بەدەم بانگ کردنیەوە و، بارینی باران یەکسەر لەگەڵ دوعای ئەودا و، تێربوونی خەڵکێکی زۆر لە خۆراکی کەمی و، قسەکردنی سووسەمار و گورگ و ئاسك و حوشتر و بەرد لە خزمەتیدا.. تا دەگاتە ئەو هەزاران موعجیزانەی کە زانایانی لێکۆڵەری فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ روونیان کردوونەتەوە.

هەروەها شەریعەتەکەشی، کە بەختەوەریی هەردوو دنیای لە خۆدا کۆ کردووەتەوە، تەسدیقی دەکات.

ئەوەش بزانە کە هەروەك ئەم بەڵگە ناوبراوانەی ناو گەردوون تەسدیقی دەکەن، هەروەها خۆیشی وەك خۆر وایە و، بەڵگەیە لەسەر خۆی، کەواتە بەڵگە خۆییەکانیش تەسدیقی دەکەن! چونکە کۆبوونەوە و یەکگرتنی هەرچی ڕەوشتی جوان هەیە، بە یەکدەنگیی هەموو لایەنێك، لە زاتی ئەودا..

هەروەها کۆبوونەوەی بەرزترینی هەرچی ڕەوشتی بەنرخ و ڕەفتاری پاك هەیە لە کەسێتییە مەعنەوییەکەیدا کە بریتییە لە "فەرمانبەری"یەکەی (ڕیسالەتەکەی)..

هەروەها هێزی ئیمانەکەی، کە هێزی زوهد و بەندایەتی و تەقواکەی شایەتیی بۆ دەدەن..

هەروەها کەماڵی باوەڕ بەخۆبوونی، کە ئەمەش بەسەرهاتەکانی ژیانی شایەتیی بۆ دەدەن..

هەروەها کەماڵی لێبڕان و توندوتۆڵیی لە کارەکانیدا و، هێزی نەترسانی لە هیچ هەڵسوکەوتێکیدا، کە ئەمەش هێزی دڵنیاییەکەی شایەتیی بۆ دەدات..

هەموو ئەمانە، وەك ڕۆژی ڕووناك، شایەتی دەدەن لەسەر ئەوەی کە: بەڵێ ڕاستە، ئەم پێغەمبەرە ﷺ دەستی بە حەقەوە گرتووە و ڕێگای حەقیقەتیشی گرتووەتەبەر.

❑ نمی سێهەم:

بزانە کە "سەردەم" و "شوێن" دەورێکی گەورە و گرنگیان لە دادوەریی ژیریەکاندا هەیە. جا ئەگەر حەزت لەم چەشنە دادوەرییە هەیە، ئەوا فەرموو با پێکەوە بڕۆین بۆ باشترین سەدە و چەرخی بەختەوەریی پێغەمبەرێتی، تاکو - با بە ئەندێشەیش بێت - بە خزمەتی

پێغەمبەر ﷺ شاد و بەختەوەر ببین، لە کاتێکدا کە لەسەر کارەکەی بەردەوامە و لە ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیدا کار دەکات. کەواتە چاوت بکەرەوە و بڕوانە..

یەکەم شت دەیبینین ئەوەیە کە:

کەسێکی لەعادەت بەدەر، دیمەنێکی لەڕادەبەدەر جوانی لەگەڵ ڕەوشتێکی لەڕادەبەدەر بەرزدا هەیە، ئەوەتا کتێبێکی خاوەن ئیعجازی بەنرخی بە دەستەوەیە و وتارێکی ئەزەلی ڕادەگەیەنێت کە بەسەر هەموو گرۆی ئادەمیزاددا، بگرە بەسەر هەموو جینني و ئینس و، تەنانەت بەسەر هەموو بوونەوەرانیشدا دەیخوێنێتەوە.

چەندە سەرسووڕهێنەرە! ئایا لەم وتارەدا چی دەڵێت؟

بەڵێ، شتێکی گرنگ دەڵێت و، لە هەواڵێکی گەورە دەدوێت. چونکە ئەو مەتەڵە حەل دەکات کە لە نهێنیی بەدیهێنانی جیهاندایە و، ئەو گرێکوێرە و تەلیسمە داخراوەش دەکاتەوە کە لە نهێنیی حیکمەتی بوونەوەراندا هەیە و، لە بارەی ئەو سێ پرسیارە گرنگ و قورسەوە دەدوێت و وەڵامیان دەداتەوە کە ژیریی مرۆڤیان تێدا مات و سەرسام بووە، چونکە هەر ئەو سێ پرسیارەن کە هەموو بەدیهێنراوان دەیانکەن و، دەڵێن: تۆ کێیت؟.. لە کوێوە هاتوویت؟.. بەرەو کوێ دەڕۆیت؟

❑ نمی چوارەم:

تەماشای ئەم مرۆڤە نوورانی‌یە بکە و بزانە کە چۆن ڕووناکی لە حەق و ڕاستی‌یەوە بڵاو دەکاتەوە و، شەوگاری مرۆڤایەتیی کردووە بە ڕۆژی ڕووناك و زستانەکەشی بۆ کردووە بە بەهار. وەك بڵێی بوونەوەران شێوە و ڕوخساریان گۆڕاوە و ڕووگرژی لە ڕووی جیهاندا نەماوە و ئێستا دەم بە خەندە و دڵخۆش و کامەرانە.

چونکە ئەگەر لە دەرەوەی ڕووناکیی ڕێنمایی‌یەکانی ئەودا سەیری بوونەوەران بکەیت، ماتەمینگایەکی گشتیی تێدا دەبینیت و، بوونەوەرانی ناوی بە دوژمن و بیانی و نامۆ دێنە بەرچاوت و پێت وایە یەکتری ناناسن، تەنانەت دوژمنایەتیش لەگەڵ یەکتردا دەکەن و، تەنە بێ گیان و وشك و بێ‌دەنگ و سەنگەکانیشی بە چەند تەرمێکی سەرسووڕماوی حەپەساو دەبینیت و، زیندەوەران و مرۆڤەکانیش لەتاو لێدان و ئازاری نەمان و جودایی دەگرین و هەتیو کەوتوون..

ئەمەیە چییەتی(ماهیة)ی بوونەوەران لە دید و ڕوانینی ئەو کەسەی کە نەڕۆشتبێتە ناو بازنەی نووری ئەو کەسێتی‌یە و لەو ڕوانگەیەوە نەڕوانیێتە بوونەوەران.

ئنجا وەرە لە ڕوانگەی نووری ئایین و بازنەی شەریعەتەکەی ئەم کەسێتی‌یەوە سەیری بوونەوەران بکە، بزانە چۆنی دەبینیت؟ بڕوانە چۆن وێنە و ڕوخساری جیهان لە شێوەی ماتەمینگا گشتی‌یەکەوە گۆڕرا و بوو بە مزگەوتی زیکر و یادکردنەوە و کۆڕی جەزبە و شوکرانەبژێری و.. ئەو بوونەوەرانەش کە دوژمن و بیانی بوون، گۆڕران بە هاوڕێ و برای خۆشەویست و.. تەنە بێ‌دەنگ و گیانە مردووەکانیش بوون بە زیندووی دڵنەوایی‌بەخش و کار پێ‌سپێرراوی ژێربارخراو کە بە زمانی حاڵ دەستەڵات و توانای بەدیهێنەریان دەردەبڕن و.. زیندەوەرە چاو بە گریان و هەتیوەکانیش گۆڕران بە زیکرخوێن و دەمپاراو بە تەسبیحات و شوکرانەبژێری خوای گەورە، لەسەر ئەوەی کە کۆتایی بە فەرمانبەری و کاری ئەوان هێناوە و حەواندوونیەتەوە.

❑ **نمی پێنجەم:**

جموجووڵ و ئاڵوگۆڕ و جۆراوجۆری‌یەکانی بوونەوەران، بەهۆی ئەم نوورەوە، لە: (بێ‌مەبەستی و بێ‌نرخی و گاڵتەجاڕیی ڕێکەوت)ەوە، گۆڕان بە چەند نووسراوێکی پەروەردگاری و لاپەڕەکانی ئایەتە تەکوینی‌یەکان و ئاوێنەی دەرخستن و پیشاندانی ناوە جوانەکانی خواوەند، بە ڕادەیەك کە پلە و پایەی جیهان بەرز بووەوە و گەیشتە ئەوەی کە بوو بە کتێبی پڕ لە دانستی صەمەدانیی خواوەند.

ئنجا سەیری "مرۆڤ" بکە کە چۆن لەو پایە ئاژەڵی‌یە نزم و پەستەوە کە بە بۆنەی "کۆڵەواری" و "هەژاری" و، بەهۆی ئەو عەقڵەیەوە تێی کەوتبوو کە خەفەتەکانی ڕابوردوو لەگەڵ مەترسی‌یەکانی ئایندەی بۆ کاتی ئێستای دەگواستەوە، بڕوانە کە چۆن ئەو نوورە هات و ئەو کۆڵەواری و هەژاری و، عەقڵەی ڕووناك کردەوە و، وای لەو مرۆڤە کرد کە بەرەو چڵەپۆپەی بڵندی "جێ‌نشینی" سەربکەوێت و بەرز ببێتەوە! سەیر بکە و بزانە کە چۆن ئەو شتانەی بووبوون بەهۆی کەوتن و بەربوونەوەی - وەك کۆڵەواری و هەژاری و ژیری‌یەکەی - هەر ئەو شتانە بوون بەهۆی سەرکەوتن و بەرزبوونەوەی، بە بۆنەی ڕووناك بوونەوەیان بە نووری ئەم مرۆڤە نوورانی‌یە!

کەواتە ئەگەر ئەم کەسە نەبوایە، مرۆڤ و بوونەوەران و هەموو شتێك بەردەبوونەوە بۆ پلەی "نەبوون" و، نرخ و بەها و بایەخیان لە دەست دەدا! کەواتە ئەم جۆرە بوونەوەرە ناوازە و جوان و ڕەنگینانە پێویستیان بە کەسێکی وەك ئەم مرۆڤە لە عادەت‌بەدەر و پێناسەر و لێکۆڵەرە هەیە، تاکو ئاوا بیانناسێنێت. جا ئەگەر ئەم کەسە وجوودی نەبێت، دەبا بوونەوەرانیش هەر نەبن! چونکە ئەو کاتە بوونەوەران، سەبارەت بە ئێمە، هیچ واتا و ناوەڕۆکێکیان تێدا نامێنێت.

❑ نمی شەشەم:

ئەگەر دەڵێیت: ئایا ئەم کەسە کێیە کە وا بووە بە خۆری گەردوون و، بە ئایینەکەشی کەماڵاتی بوونەوەران دەردەخات و، ئایا چی دەفەرموێ؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

سەیر بکە و گوێ رابگرە، بزانە چی دەفەرموێ:

ئەوەتا هەواڵ و مزگێنیی بەختەوەرییەکی هەمیشەیی رادەگەیەنێت و.. پەردە لە رووی میهرەبانییەکی بێسنووردا لادەدات و بە ئاشکرا خەڵکی بۆ لا بانگ دەکات و.. شارەزا و رێ پیشاندەر و سەرپەرشتیکاری جوانکارییەکانی دەستەڵاتی پەروەردگاریتیی خواوەندە و، پێناسەر و دەرخەری نهێنییەکانی گەنجینەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەیە.

فەرموو لە رووی فەرمانبەرییەکەیەوە (کە پێغەمبەرێتییەکەیەتی) سەیری بکە، دەبینیت: بەڵگەی حەق و، چرای راستی و، خۆری هیدایەت و، هۆکاری بەدەستهێنانی بەختەوەرییە..

ئنجا لە لایەنی کەسایەتییەکەیەوە (واتە بەندایەتییەکەی بۆ خوای گەورە) سەیری بکە. دەبینیت: نموونەی میهرەبانیی خوایی و، پەیکەری بەزەیی پەروەردگاری و، شەرەفی حەقیقەتی مرۆڤایەتی و، رووناکترین گوڵی بەری درەختی بەدیهێنراوانی خوای گەورەیە.

پاشان سەیر بکە و بزانە کە چۆن رووناکیی خۆی و ئایینەکەی، بە خێرایی هەورە بروسکە، دەورەی خۆرهەڵات و خۆرئاوای دا و، نزیکەی نیوەی گۆی زەوی و پێنج یەکی گرۆی ئادەمیزاد، بە خواستی دڵ، دیاریی هیدایەتەکەی ئەویان بە رادەیەك وەرگرت، کە گیانی خۆشیانی لە پێناودا بەخت دەکەن!

جا ئایا نەفس و شەیتان توانای ئەوەیان هەیە کە - بە بێ ئەوەی خۆیان بە هەڵەدا بەن - موناقەشەی ئەو بیروباوەڕانە بکەن کە ئەم مرۆڤە رایگەیاندوون؟ بە تایبەت لەو دەعوایەی‌دا کە بناغەی هەموو بیروباوەڕەکانی تریەتی و، بریتییە لە: "لا إلـه الا الله" بە هەموو پلەکانیەوە؟!

❑ نمی حەوتەم:

ئەگەر دەتەوێت بزانیت ئەو شتەی کە پێغەمبەر ﷺ هەڵدەسوورێنێت و دەیخاتەکار، تەنها هێزێکی قودسیی بەرزە و هیچی تر نییە، ئەوا سەیری ئەو هەڵسوکەوتانەی بکە کە لەم دوورگە فراوانەدا کردوونی!

ئایا نابینیت ئەو هۆز و تیرە سەرەتایی و دواکەوتووانەی ناو ئەم بیابانە بەرینە، کە سەبارەت بە داب و نەریتیان توندوتیژن و لە دەمارگیری و ناکۆکیی نێوانیاندا تابلێی

سەرسەختن، چۆن ئەم کەسە، ڕەوشتە خراپە سەرەتاییەکانی ئەوانی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لابرد و بە یەکجاری ڕیشەکەنی کردن و، لە بریی ئەوانە، ڕەوشتی جوان و بەرزی پێ بەخشین و، کردنی بە مامۆستا و ڕابەری جیهانی مرۆڤ و نەتەوە پێشکەوتووە خاوەن شارستانێتییەکان!

ئنجا بڕوانە! ئەم دەستەڵاتەشی تەنها بەسەر ڕووی دەرەوەدا نییە! بەڵکو دەرگای "دڵان" و "ژیرییەکان"یش دەکاتەوە و "ڕۆح" و "دەروونەکان"یش دەهێنێتە ژێر بار، بە ڕادەیەك کە بووە بە خۆشەویستی دڵان و، مامۆستای ژیرییەکان و، پەروەردەکاری دەروونەکان و، پادشای گیانەکان!!

❑ نمی هەشتەم:

شتێکی ئاشکرایە کە لابردنی عادەتێکی بچووکی - بۆ نموونە وەك جگەرەکێشان - بە تەواوی، لەناو دەستە و تاقمێکی کەمدا، کە کاربەدەستێکی گەورە بیەوێت لایبات، لەوانەیە زۆر دژوار بێت، با هیممەتێکی گەورەشی تێدا بەکاربهێنێت.. کەچی ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ چەندین عادەتی گەورە و زۆری لە نێوان چەندین هۆز و تیرەی گەورەدا بە تەواوی لابرد، کە سەبارەت بە نەریت و هەست و نەستەکانیان گەلێ سەرسەخت و دەمارگیر بوون. کەچی ئەم پێغەمبەرە ﷺ بە هێز و هیممەتێکی وا کە بە چاوی ڕواڵەتبینی بە "کەم" دیارە و لە ماوەیەکی کورتیشدا، ئەو هەموو عادەتانەی لە لا هەڵگرتن و، لە بریی ئەوانە و لە سروشت و ڕەفتاریاندا چەندین نەریتی بەرز و ڕەوشتی بەنرخی تێدا دامەزراندن!

هەرکە سەیری ئەم پێغەمبەرە ﷺ دەکەین، هەزاران کاری ئاوا لە عادەتبەدەر لە هەڵسوکەوتەکانیدا دەبینین.

جا هەر کەسێك ئەم سەردەمە پڕ لە بەختەوەرییەی پێغەمبەر ﷺ نەبینێت، ئەوا ئەم دوورگەیە دەکەین بە چاویدا و، تەحەددای دەکەین، دەبا خۆی تێدا تاقی بکاتەوە.. با سەد کەس لە فەیلەسووفەکانیان لەگەڵ خۆیاندا ببەن و بڕۆن بۆ ناو ئەو دوورگەیە و لەوێ سەد ساڵی ڕەبەق کار بکەن و هەوڵ بدەن، با بزانین ئایا لە ماوەی ئەو سەد ساڵەدا دەتوانن یەك لە سەدی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە ساڵێکی ئەو کاتەدا ئەنجامی داوە، ئەوان بەو سەد ساڵە ئەنجامی بدەن؟!

❑ نمی نۆهەم:

ئەگەر بە باشی شارەزای سروشتی مرۆڤ بیت، ئەوا دەزانیت کە هەرگیز بۆ هیچ مرۆڤێکی ژیر ئەوە مەیسەر نابێت کە: قسەیەك بکات بواری موناقەشەی تێدا بێت و، قسەکەش درۆیەکی وا بێت کە ئەگەر ئاشکرا ببێت ئەو کەسەی پێ شەرمەزار ببێت و، ئنجا

بە بێ هیچ شەرم و شکۆ و دوودڵی و دڵەتەپێیەك (کە ئەوە بگەیەنن فێڵ لە قسەکەیدایە) و بە بێ هیچ ڕیا و زۆر لەخۆکردنێك (کە ئەوە بگەیەنێت درۆ دەکات) لە بەردەم دوژمنە ڕەخنەگرەکانیدا ئەو قسەیە بکات. با ئەو مرۆڤەش کەسێکی بچووك بێت و، قسەکەشی لە بارەی کار و فەرمانبەرییەکی بچووك و، بە جۆرێکی بێنرخ و، لەناو کۆمەڵێکی کەم و، لە بابەتێکی بێ بایەخدا بێت..

بەڵێ، شتی وا هەرگیز بۆ مرۆڤی ژیر مەیسەر نابێت.

ئیتر ئایا چۆن فرتوفێڵ یان شتی پێچەوانەی ڕاستی، تێکەڵ بە قسە و دەعوای ئەم جۆرە کەسە دەبێت کە: فەرمانبەرێکی مەزنە، لە کارمەندییەکی گەورە و بوارێکی گەورەدا و، بە چۆنێتییەکی گەورە، لە کاتێکدا کە پێویستی بە پاراستنێکی گەورەیە، لەناو کۆمەڵێکی گەورە و زۆردا و، لە بەرامبەر دوژمنایەتییەکی یەکجار سەخت و، لە مەسەلە و دەعوایەکی گرنگ و گەورەدا؟

ئەوەتا ئەو کەسە (کە پێغەمبەرە ﷺ) بە بێ ئەوەی گوێ بە کەس بدات، قسەی خۆی دەکات و سڵ لە هیچ شتێك ناکاتەوە و دوودڵی و شەرم و ترس و بیم و دڵەتەپێ لە هەڵسوکەوتیدا نییە و، ئنجا زۆر بە پاکی و لێبڕان و دڵسۆزی قسەی خۆی دەکات، بە ڕادەیەك کە دەماری دوژمنانی پێ گرژ ببێت، چونکە دەروون و ژیریی دوژمنانی بە لاواز و بێنرخ دادەنێت و، عیززەتیان دەشکێنێت و، هەموو ئەمانەشیان بە شێوەیەکی توند و تیژی تابلێی بەرز، ئاراستە دەکات!

باشە ئایا ئیتر دەگونجێ فروفێڵ تێکەڵ بە دەعوایەکی ئاوا ببێت، کە دەعوای کەسێکی وابێت و، لەو حاڵەتەشدا بێت کە باس کرا؟.. نەخێر، ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحى﴾ (النجم:٤).

بەڵێ، حەق زۆر لەوە بلند و گەورەترە کە فێڵ بەکاربهێنێت و، ڕوانینی حەقیقەتیش گەلێ لەوە بەرزترە کە فڕت و فێڵی لێ بکرێت. بەڵێ، ڕێبازە ڕەوا و حەقەکەی ئەو هیچ پێویستییەکی بە فڕت و فێڵ نییە و، ڕوانینە تیژبینەکەشی لەوە بەرزترە کە خەیاڵ و ڕاستیی لێ تێکبچێت و لە بەرچاویدا بئاڵۆزێن!

❑ **نمی دەهەم:**

سەیری بکە و گوێی لێ ڕابگرە، بزانە چی دەفەرموێ. ئەوەتا لە بارەی چەند ڕاستییەکی سەرسووڕهێنەر و، چەند مەسەلە و کێشەیەکی وەها دەدوێت و دەکۆڵێتەوە، کە دڵی مرۆڤ ڕادەکێشن و سەرنجی ژیرییەکانیش بەرەو بیرکردنەوە و تێڕامان ڕادەپێچن. چونکە وەك

زانراوە، زۆر کەس لەوانەی کە حەزیان لە هەواڵ زانینی شتی نادیار و نەزانراوە، لە پێناوی ئەم حەزەیاندا بۆ دەرخستنی ڕاستیی شتان، گەیشتوونەتە ئەوەی گیانیشیان بەخت بکەن!

ئایا نابینیت گەر پێت بوترێت:

ئەگەر نیوەی تەمەنت یان نیوەی سامانەکەت بەخت بکەیت، ئەوا لە "مانگ" یان لە ئەستیرەی بارام(مشتری)ەوە، یەکێك دێت و هەواڵی بارودۆخە سەرسووڕهێنەرەکانی ئەوێ و، هەواڵی دواڕۆژی خۆیشت دەداتێ. ئەگەر کەسێك وات پێ بلێت، لام وایە ئامادەیت نیوەی تەمەنت بەخت بکەیت یان نیوەی سامانت لەو پێناوەدا دابنێیت!

شتێکی گەلێ سەیرە کە ئامادە بیت لە پێناوی زانینی شتێکدا - کە زۆر پەرۆشی بیزانیت - نیوەی تەمەن و سامانت بەخت بکەیت، بەڵام بایەخ بە هەواڵدانی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ نەدەیت کە یەکدەنگیی "ئەهلی شهوود" و تەواتوری پسپۆڕان لە پێغەمبەران و صیددیقان و ئەولیا و زانا لێکۆڵەرەکان تەسدیقی دەکەن، لە کاتێکدا کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە بارەی ئیشو کاری پادشایەکەوە دەدوێت کە "مانگ" لە وڵاتی ئەودا لە مێشێك زیاتر نییە کە بە دەوری پەپوولەیەکدا بسووڕێتەوە کە ئەویش بە دەوری چرایەك لە نێوان هەزاران چرادا هەڵدەسووڕێت کە ئەو پادشایە لە مەنزڵێکدا دایگرساندوون لە نێوان هەزاران مەنزڵی میوانداریيەکدا کە بۆ میوانەکانی ئامادەی کردوون.. هەروەها هەواڵی جیهانێکی پڕ لە شتی سەرسووڕهێنەر و لە عادەتبەدەر و، ڕووداوێکی گەردوونیی وەها سەیر ڕادەگەیەنێت کە ئەگەر گۆی زەوی پارچە پارچە ببێت و چیاکانیشی وەك هەور بچن بە حەوادا، هێشتا هێندەی یەك لە دەی ئەو ڕووداوە گەردوونییە سەیرە دەرناچێت!

جا ئەگەر دەتەوێ ئەمانە بزانیت، ئەوا لەسەر زمانی ئەو پێغەمبەرەوە ﷺ گوێ لەم جۆرە سوورەتانە ڕابگرە:

﴿إذا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾.

﴿إذا السَّماءُ انْفطَرَتْ﴾.

﴿إذا زُلْزِلَتِ الأَرْضُ زِلْزالَها﴾.

﴿اَلْقَارِعَة ۞ ما الْقارِعَة﴾!

هەروەها بە جۆرێکی ڕاست هەواڵی داهاتوویەك بە ئێمە دەدات، کە داهاتووی هەموو دنیا لە بەرامبەریەوە وەك دڵۆپێك سەرابی بێسوود وایە لە بەرامبەر زەریایەکی بێ لێوارەوە.. هەروەها مزگێنیی ئەوەمان پێ دەدات کە بە چاو دیویەتی، لە بارەی بەختەوەرییەکی ئەوتۆ کە بەختەوەریی دنیا لە چاویا وەك بریسکەیەکی لەناوچوو وایە لە بەرامبەر خۆرێکی هەمیشەییەوە!

❑ نمی یازده‌هه‌م:

به‌ڵێ، له‌ پشت په‌رده‌ی ئه‌م بوونه‌وه‌ره‌ پڕ لـه‌ نـهێنی و شته‌ سه‌رسووڕهێنه‌رانه‌وه‌، چـه‌ندین شتی سه‌رسووڕهێنه‌رتر چاوه‌ڕێمانن و، ده‌بێ كه‌سێكی سه‌رسووڕهێنه‌ری له‌عاده‌تبه‌ده‌ریش هه‌بێت كه‌ هه‌واڵی ئه‌و شته‌ سه‌رسووڕهێنه‌رانه‌ ڕابگه‌یه‌نێت و، لـه‌ ئه‌حواڵـه‌كانی ژیـانی ئـه‌و كه‌سـه‌وه‌ بـه‌ ئاشـكرا ده‌ربكـه‌وێت كـه‌ ئـه‌و شـتانه‌ی باسـیان ده‌كـات، ده‌یـانبینێت ئنجـا هه‌واڵه‌كانیان ڕاده‌گه‌یه‌نێت و شایه‌تی‌یان له‌سه‌ر ده‌دات.

به‌ڵێ، له‌ هه‌ڵسوكه‌وت و ڕه‌فتاره‌كانیه‌وه‌ ده‌بینین كه‌ ئه‌و شتانه‌ی لێیان ده‌دوێت، له‌ پێشدا ده‌یانبینێت ئنجا شایه‌تی‌یان له‌سه‌ر ده‌دات و هه‌ڕه‌شه‌ و مزگێنی‌یه‌كانیش ڕاده‌گه‌یه‌نێت.

هه‌روه‌ها ئه‌و شتانه‌ش كه‌ باسیان ده‌كات، هـه‌موویان مایه‌ی ڕه‌زامه‌ندیی ئـه‌و خواوه‌نـده‌ن كـه‌ په‌روه‌ردگاری هـه‌موو جیهانه‌كانـه‌ و نیعمه‌تـه‌ ئاشـكرا و په‌نهانـه‌كانی خـۆی به‌سـه‌رد بارانداووین. هه‌روه‌ها پێمان ڕاده‌گه‌یه‌نێت كه‌ ئـه‌و په‌روه‌ردگاره‌ چیـی لـه‌ ئێمـه‌ ده‌وێـت تـاكو ئه‌نجامی بده‌ین، هه‌روه‌ها... هتد.

جا داخ بۆ ئه‌وانه‌ی كه‌ بێ‌ئاگان و، زه‌ره‌رمه‌ندییش بۆ ئه‌وانه‌ی ڕێگایان ون كردووه‌!

مرۆڤ سـه‌ری لـه‌ گه‌لـحۆیی و بێ‌ئاگـایی زۆربـه‌ی خـه‌ڵكی سـووڕ ده‌مێنێـت كـه‌ چـۆن سه‌باره‌ت به‌م حه‌ق و ڕاستی‌یه‌ خۆیـان كـه‌ڕ و كوێـر ڕاگرتـووه‌ و، بایـه‌خ بـه‌ فـه‌رمووده‌ی ئـه‌م پێغه‌مبه‌ره‌ به‌ڕێزه‌ ﷺ ناده‌ن، له‌ كـاتێكدا كـه‌ ده‌بێ مـرۆڤ ڕۆحـی خـۆی بۆ مرۆڤـی وا بـه‌خت بكات و، واز له‌ هه‌موو دنیا بهێنێت و به‌ په‌له‌ ڕووه‌و ئه‌و بڕوات؟!

❑ نمی دوازده‌هه‌م:

بزانـه‌ ئـه‌م پێغه‌مبـه‌ره‌ بـه‌ڕێزه‌ی ﷺ كـه‌ ئێمـه‌ كه‌سـێتی‌یه‌ مه‌عنه‌وی‌یه‌كـه‌ی ده‌بینـین و لـه‌ جیهانیشدا به‌ ئیشوكاره‌ به‌رزه‌كانی تابلێی به‌ناوبانگه‌، هه‌روه‌ك به‌ڵگه‌یه‌كی گۆیا و ڕاستگۆیه‌ له‌سه‌ر "ته‌وحید" و، ڕێ‌پیشانده‌رێكی ئه‌وه‌نده‌ حه‌ق و ڕاسته‌ بـه‌ ئـه‌ندازه‌ی ڕاستیی "یـه‌كتایی خوا"، هه‌ر بـه‌و جۆره‌ش به‌ڵگه‌یـه‌كی بێ‌گومـان و ڕوونـه‌ له‌سـه‌ر "به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشـه‌یی".

به‌ڵكـو هـه‌روه‌ك چـۆن بـه‌ بۆنـه‌ی بـانگه‌وازه‌كـه‌ی و ڕێنمـایی كـردنه‌كـه‌یه‌وه‌ بـووه‌ بـه‌هۆی هاتنه‌دی و گه‌یشتنی مرۆڤ بـه‌ به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشـه‌یی، هـه‌ر بـه‌و جـۆره‌ش، بـه‌ بۆنـه‌ی نـزا و پاڕانه‌وه‌ و به‌ندایه‌تی‌یه‌كه‌یه‌وه‌ بۆ خـوای گـه‌وره‌، بـووه‌ بـه‌هۆی به‌دیـهێنان و دروسـتكردنی ئـه‌و به‌خته‌وه‌ری‌یه‌ هه‌میشه‌یی‌یه‌..

جا ئه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت ئه‌مه‌ بزانیت، ئه‌وا فه‌رموو سه‌یری نوێژه‌ گه‌وره‌كه‌ی بكه‌، كه‌ ئـه‌وه‌نده‌ گه‌وره‌ و فراوانه‌ خـه‌ڵكی دوورگـه‌ی عـه‌ره‌ب. بـه‌ڵكو دانیشـتووانی گـۆی زه‌ویـش لـه‌ پشـت سه‌ریه‌وه‌ ڕیزیان به‌ستووه‌ و ئه‌م نوێژه‌ی له‌گه‌ڵدا ده‌كه‌ن. ئنجا سه‌یری بكه‌، ده‌بینیت ئه‌و نوێـژه‌

بەو کۆمەڵــە زۆرەوە بــە شـێوەیەك دەکـات کــە خــۆی ئیمامــە و لــە میحرابـی ســەردەم و چەرخەکەی‌دا ڕاوەستاوە و لە پشت سەریشیەوە هەموو مرۆڤە بەڕێزەکانی گرۆی ئادەمیزاد هەر لە ئادەمەوە - دروودی لەسەر بێت - تا ئێستا و تا دنیاش دنیایە، لە ڕیزی سەردەمەکاندا نوێژیان لە پشت سەریەوە دابەستووە و "ئامین" بۆ پاڕانەوە و نزاکانی دەکەن. ئنجا گوێ ڕابگرە و بزانە لەو نوێژەدا کە بەو کۆمەڵە زۆرەوە دەیکات، چی دەڵێت؟ ئەوەتا بۆ شتێکی زۆر گەورە و پێویست و گشتیی وا دەپاڕێتەوە کە زەوی و ئاسمان و هەموو بوونەوەران بەشداریی ئەم پاڕانەوەیەی دەکەن و، هەموو بە زمانی حاڵیان دەڵێن: بەڵێ ئەی پەروەردگارمان! نزاکەی گیرا بکە، چونکە ئێمەش و هەموو ئەو درەوشانەوانەی ناوە جوانەکانی خۆیشت لە ئێمەدا، هەمووومان داوای هاتنەدیی هەمان خواست دەکەین کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە نزاکەی‌دا داوای دەکات.

ئنجا سەیری چۆنێتیی پاڕانەوەکەی بکە، بزانە چۆن بە هەژاری‌یەکی گەورە و، تاسەیەکی توندوتیژ و، خەمێکی قووڵ و، خۆشەویستی‌یەکی خەفەتاوی‌یەوە دەلاڵێتەوە، بە جۆرێك کە سۆز و هەستی بوونەوەرانی هەژاندووە و ئەوانیشی خستووەتە گریانەوە و، لە نزا و پاڕانەوەکەی خۆی‌دا بەشداری کردوون!

ئنجا سەیر بکە و بزانە بۆ چ مەبەستێك وا بەو جۆرە دەلاڵێتەوە. ئەوەتا بۆ ئامانج و مەبەستێك دەپاڕێتەوە کە ئەگەر نەیەتەدی ئەوا پایەی مرۆڤ، بەڵکو دنیا و تەنانەت هەموو بوونەوەران بۆ نزمترین پلە دادەبەزێتە خوارەوە و، هیچ نرخ و بایەخێکیان نامێنێت، بە هاتنەدیی ئەو مەبەستەش بوونەوەران بەرز دەبنەوە و پلەی کەماڵی خۆیان وەردەگرن.

پاشان بڕوانە چۆن بە داوای یارمەتی‌دانێکی دوور و درێژ و لالانەوەیەکی بەکوڵ و داوای بەزەیی‌یەکی خەماوی‌یەوە، لە خوا دەلاڵێتەوە. بە جۆرێك کە تاسە و شەوقی عەرش و ئاسمانەکانیشی هەژاندووە و دەڵێی عەرش و ئاسمان پێکەوە هاوار دەکەن و دەڵێن: "خوایە گیان! پاڕانەوەکەی گیرا بکە"!

ئنجا بڕوانە ئەم داخوازی‌یەی لە کێ داوا دەکات؟ بەڵێ، لەو خوایەی داوا دەکات کە بەتوانا و بیسەر و بەخشندە و زانا و بینەر و میهرەبان و بە بەزەیی‌یە.. ئەو خواوەندەی کە شاراوەترین نزای نادیارترین زیندەوەر لە پەنهانترین پێویستی‌دا، دەبیستێت و، وەك لە بەرچاودایە پاڕانەوەکەی گیرا دەکات و کارەکەی بۆ ئەنجام دەدات.. هەروەها لەو خواوەندەی کە کەمترین هیوای کەمترین زیندەوەر لە کەمترین مەبەستدا دەبینێت و، وەك لە بەرچاودایە، ئەو زیندەوەرە بەو ئاوات و مەبەستەی خۆی دەگەیەنێت، بە جۆرێکی پڕ لە دانست و شێوازێکی ڕێکوپێکیش کەرەم و میهرەبانیی خۆی بەرامبەریان دەردەخات.

كه‌واته هیچ گومانێك له‌وه‌دا نامێنێت كه ئه‌م په‌روه‌رده‌كردن و كارئه‌نجامدانه، ته‌نها له لایه‌ن خوایه‌كی بیسه‌ر و زانا و بینه‌ر و داناوه‌یه.

❑ نمی سیازده‌هه‌م:

چه‌نده جێی سه‌رسوورمانه!.. ئه‌م پێغه‌مبه‌ره ﷺ داوای چی ده‌كات كه وا له سه‌رزه‌وی‌دا راوه‌ستاوه و مرۆڤه به‌رێزه‌كانی گرۆی مرۆڤایه‌تیی له پشت سه‌ری خۆی كۆ كردووه‌ته‌وه و، رووه‌و عه‌رشی مه‌زنی په‌روه‌ردگار ده‌ستی به‌رز كردووه‌ته‌وه و خه‌ریكی دوعا و پاڕانه‌وه‌یه‌كی وایه كه هه‌موو جینني و ئینس "ئامین"ی بۆ ده‌كه‌ن و، له كاروباره‌كانیه‌وه ده‌رده‌كه‌وێت كه ئه‌م مرۆڤه مایه‌ی شه‌ره‌فمه‌ندیی ره‌گه‌زی مرۆڤ و هه‌ڵكه‌وته‌ی بێ وێنه‌ی هه‌موو كات و گه‌ردوونه و مایه‌ی شانازیی هه‌موو بوونه‌وه‌رانه له هه‌موو كاتێكدا..

له پاڕانه‌وه‌كه‌شی‌دا هه‌موو ناوه جوانه‌كانی خواوه‌ند، كه له ئاوێنه‌ی بوونه‌وه‌راندا ده‌رده‌كه‌ون و ده‌دره‌وشێنه‌وه، ده‌كات به تكاكاری نزاكانی، ته‌نانه‌ت خودی ئه‌و ناوانه‌ش هه‌مان پاڕانه‌وه و داواكاری‌یان هه‌یه كه ئه‌و داوایان ده‌كات!

گوێ رابگره، ئه‌وه‌تا داوای ژیانی هه‌میشه‌یی و به‌یه‌ك گه‌یشتن و به‌هه‌شت و ره‌زامه‌ندیی خواوه‌ند ده‌كات!

خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌و هۆكاره له‌ژماره‌به‌ده‌رانه‌ی وه‌ك: میهره‌بانی و چاودێری و دانایی و دادگه‌ری، كه به چاو ده‌بینرێن و له‌سه‌ر بوونی ئاخیره‌ت به‌ندن، ئه‌گه‌ر ئه‌م هۆكارانه و ناوه پیرۆزه‌كانی خواوه‌ندیش كه چه‌ند هۆكارێكی داخوازی قیامه‌تن، گه‌ر هه‌موو ئه‌مانه نه‌بوونایه، ئه‌وا هه‌ر ته‌نها پاڕانه‌وه‌كه‌ی ئه‌م كه‌سه نوورانی‌یه سه‌روزیاد بوو بۆ ئه‌وه‌ی كه په‌روه‌ردگاری، به تایبه‌تی به‌هه‌شت بۆ ئه‌و و هاوره‌گه‌زی ئه‌و (كه گرۆی مرۆڤه) به‌دی بهێنێت و دروستی بكات، وه‌ك له هه‌موو به‌هارێكدا چه‌ندین به‌هه‌شتی رازاوه به موعجیزاتی به‌دیهێنراوانی، بۆ ئێمه دروست ده‌كات! كه‌واته هه‌روه‌ك پێغه‌مبه‌رێتی‌یه‌كه‌ی بوو به‌هۆی كردنه‌وه‌ی ده‌رگای ئه‌م دنیایه بۆ تاقیكردنه‌وه و به‌ندایه‌تی، هه‌ر به‌و جۆره‌ش نزا و پاڕانه‌وه‌ی به‌ندایه‌تی‌یه‌كه‌ی، بوو به‌هۆی كردنه‌وه‌ی ده‌رگای ئه‌ودنیا بۆ تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه و پاداشت به‌خشین.

جا ئایا ده‌گونجێ ئه‌م رێكوپێكی‌یه زۆر و، به‌رزی‌یه فراوان و، سنعه‌ته جوان و بێ عه‌یب و، جوانی‌یه دوور له ناشیرینی‌یه‌ی كه له راده‌یه‌كی وه‌هادایه وا له كه‌سێكی وه‌ك (غه‌زالی) ده‌كات كه بڵێت: "ليس في الإمكان أبدع مما كان"، هه‌موو ئه‌مانه بگۆڕرێن و ناشیرینی‌یه‌كی عه‌یبدار و، سته‌مێكی ناڕه‌وا و، ئاڵۆزبوونێكی گه‌وره جێ‌یان بگرێته‌وه، واته:

قیامەت نەیەتەکایەوە؟ چونکە گوێ لێبوونی نزمترین دەنگ لە نزمترین بەدیهێنراوەوە لە بارەی نزمترین پێویستی و مەبەستیەوە و، گیرابوونی ئەو نزا و داواکاری‌یەی بەوپەڕی بایەخ پێدانەوە، ئەم کارە - وەك لە بەرچاودایە - ڕوو بدات.. بەڵام لە هەمان کاتدا گوێ لە بەرزترین دەنگ و پاڕانەوە لە بارەی گرنگترین و پێویستترین ئامانج و پێویستی‌یەوە نەگیرێت و، جوانترین داواکاری لە جوانترین هیوا و ئومێددا قبووڵ نەکرێت، کارێکی ئەوەندە ناشیرین و ناتەواوە کە هیچ ناتەواوی و ناشیرینی‌یەکی تری پێ ناگات. ئەوەش شتێکی یەکجار دوور و نەگونجاوە و، هەرگیز ئەم جوانی‌یە بێ‌عەیبە، ئەو ناشیرینی‌یە لەرادەبەدەرە قبووڵ ناکات!

دەسا ئەی هاوەڵەکەم لەم گەشتە سەیرەدا!

ئایا ئەمانەی کە بینیتن سەروزیاد نین؟ خۆ ئەگەر دەتەوێت هەرچی شت هەیە لە بارەی ئەم زاتەوە بیانزانیت، ئەوا باش بزانە کە ئەو کارە شتێکی مەحاڵە و بۆ کەس نایەتەدی، تەنانەت ئەگەر سەد ساڵی ڕەبەقیش لەم دوورگەیەدا بمێنینەوە، هێشتا ناتوانین لە سەیر کردنی یەك لە سەدی کاروبار و فەرمانبەری‌یە سەیر و سەرسووڕهێنەرەکانی ببینەوە و، بێزاریش نابین.

کەواتە با بەرەو دواوە بگەڕێینەوە و، چەرخ بە چەرخ و سەردەم بە سەردەم بڕوانین و بزانین چۆن ئەم چەرخانەی تر لە ڕووناکیی چەرخەکەی ئەویان وەرگرتووە و پێی گەشاونەتەوە و، وەکو بەهار پێی سەوز و ڕەنگین بوون..

بەڵێ، دەبینیت گوڵانی هەر چەرخێك لەم چەرخانەی بەسەریاندا تێپەڕ دەبین، دەمیان بە ڕووناکیی خۆری چەرخی بەختەوەری پشکووتووە و، هەریەك لەو چەرخانە چەندین بەرهەمی بەرز و بەنرخی بووە، وەك: ئەبوو حەنیفە و، شافیعی و، ئەبوو یەزیدی بەستامی و، جونەید و، شێخ عەبدولقادری گەیلانی و، ئیمامی غەزالی و، شاهی نەقشبەند و، ئیمامی ڕەببانی و، هەزاران بەروبوومی ڕووناکی تری وەك ئەو زانایانە، کە لە ڕووناکیی ڕێنمایی ئەو زاتە نوورانی‌یە بەهرەمەند بوون. جا با ئێستا باسکردنی ئەوەی کە لە گەڕانەوەکەماندا دیومانە، بە درێژی بۆ کاتێکی تری هەڵبگرین و، ئێستا صەلات و سەلام پێشکەش بەو زاتە نوورانی‌یە بکەین کە خاوەنی موعجیزاتە و گەورە و سەروەرمان حەزرەتی محەممەدە ﷺ لەو صەلات و سەلامانەی کە هێما بۆ هەندێ لە موعجیزەکانی دەکەن:

"على مَنْ أُنزِلَ عليه الفرقان الحكيم من الرحمن الرحيم من العرش العظيم سيدنا محمد ألفُ ألفِ صلاةٍ وسلامٍ بعدد حسنات أمته.

علــى مَن بشّر برسالته التوراة والإنجيل والزبور والزبر، وبشّــر بنبوتــه الإرهاصــاتُ وهواتفُ الجن وكواهن البشر وانشق باشارته القمر: سيّدنا محمد ألفُ ألفِ صلاةٍ وســـلامٍ بعدد أنفاس أمته.

علــى مَن جاءت لدعوته الشجر، ونزل سرعةً بدعائه المطر، وأظلّته الغمامة من الحــرّ. وشبع من صاعٍ من طعامه مآت من البشر، ونبع الماء من بين أصابعه كالكوثر، وانطق الله له الضبّ والظبي والذئب والجذع والذراع والجمل والجبل والحجر والمَدَر والشجر، صـــاحب المعراج ومازاغ البصر، سيدنا وشفيعنا محمد ألفُ ألف صلاة وسلام بعدد كـــل الحـــروف المتشكلة في الكلمات المتمثلة باذن الرحمن في مرايا تموجات الهواء عند قراءة كل كلمة مـــن القرآن من كل قارئ من أول النـــزول الـــى آخر الزمان، واغفرلنا وارحمنا يا إلهنا بكـــل صلاة منها. آمين".

(بزانه! ئه‌و شتانه‌ی كه ده‌بن به به‌ڵگه‌ی پێغه‌مبه‌رێتیی حه‌زره‌ت ﷺ له‌ ژماره نایه‌ن و، زانا لێكۆڵه‌ره مه‌زنـه‌كان لـه‌م باره‌یـه‌وه كتێبیـان دانـاوه، منیـش لـه‌گـه‌ڵ كۆڵـه‌واری و كـه‌م‌توانایی خۆمدا چه‌ند تیشكێكی ئه‌و خۆره‌م له‌ نامیلكه‌یه‌كی توركی‌دا به‌ ناونیشانی: "چه‌ند تیشـكێك له‌ ناسینی پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ" و، له‌ مه‌كتووبی نۆزده‌هه‌میشـدا ڕوون كردووه‌تـه‌وه. به‌ كورتیش لایه‌نه‌كانی ئیعجـازم لـه‌ موعجیزه گه‌وره‌كـه‌ی‌دا كـه‌ قورئانـه، ڕوون كردووه‌تـه‌وه و، به‌ پێی تیگه‌یشتنی كه‌موكورتی خۆیشم له‌ په‌یامی "لوامع"دا ئاماژه‌م بۆ چل ڕووی ئیعجـازی قورئان كردووه، یه‌كێكیشم لـه‌و چـل ڕووه، كـه‌ لایـه‌نی ڕه‌وانبێژی‌یـه‌ بـه‌رزه‌ بێ وێنه‌كـه‌ی داڕشتنی قورئانـه، لـه‌ نزیكـه‌ی چـل لاپه‌ڕه‌یـه‌كدا لــه‌ ته‌فسیره‌ عه‌ره‌بی‌یه‌كـه‌م كـه‌ نـاوی: "اشـارات الاعجاز"ه، به‌ ڕوونی باس كردووه.. جا ئه‌گه‌ر حه‌ز ده‌كه‌یت ئاگاداری ئه‌مانه‌ ببیـت، ئه‌وه فه‌رموو سه‌ر له‌و سێ كتێبه‌ بده).

❑ نمی چوارده‌هه‌م:

بزانـه! قورئـانی پیرۆز، كـه‌ خـۆی لـه‌ خـۆی‌دا ده‌ریـای موعجیزاتـه و موعجـیزه‌ی هـه‌ره گـه‌وره‌ی پێغه‌مبـه‌ره ﷺ، "پێغه‌مبـه‌رێتی"ی حـه‌زره‌ت و، "یـه‌كتایی" خـواوه‌نـد بـه‌ جوانـی ده‌چه‌سپێنێت و، ئـه‌وه‌نده‌ به‌ڵگـه‌ی زۆر و زه‌بـه‌نده‌ش له‌سـه‌ر ئـه‌م مه‌سـه‌لانه‌ ده‌رده‌خـات و ده‌هێنێته‌وه، كه‌ ئیتر پێویست بـه‌ هیـچ به‌ڵگه‌یـه‌كی تـر نامێنێتـه‌وه، وا ئێمـه‌ش لـێره‌دا ئاماژه‌ بۆ پێناسـه‌كه‌ی ده‌كـه‌ین و، پاشـان په‌نجه بـۆ چـه‌ند بریسـكه‌یه‌كی ئیعجازه‌كـه‌ی درێـژ ده‌كـه‌ین. له‌وانه‌ی كه‌ هه‌ندێ كه‌س پرسیاریان له‌ باره‌وه ده‌كه‌ن:

ئەگەر دەڵێیت: قورئان چی‌یە؟

لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

قورئان سەرگوزەشتەی ئەزەلیی ئەم بوونەوەرانەیە و، وەرگێڕی ئەبەدیی ئەو زمانانەی بوونەوەرانە کە ئایەتە تەکوینی‌یەکانی گەردوون دەخوێننەوە و، موفەسسیر و ڕوونکەرەوەی کتێبی جیهانە.. هەروەها دەرخەر و ئاشکراکەری ئەو گەنجینە پەنهانانەی ناوەکانە کە لە نێوان زەوی و ئاسمانەکاندا شارراونەتەوە.. هەروەها کلیلێکە بۆ کردنەوەی ڕاستیی ئەو کاروبارانەی کە لە ناوەندی دێرەکانی ڕووداوەکاندا حەشار دراون.. هەروەها زمانی جیهانی پەنهانە لە جیهانی بینراودا.. هەروەها گەنجینەی گفتوگۆ ئەزەلی‌یە پاك و بێ گەرد و، ئاوڕدانەوە میهرەبانی‌یە ئەبەدی‌یەکانی خوایە.. هەروەها بناغە و نەخشە و ئەندازە و خۆری ئەم جیهانە مەعنەوی‌یە ئیسلامی‌یەیە.. هەروەها نەخشەی جیهانی ئەودنیایە.. هەروەها وتەیەکی ڕوونکەرەوە و، تەفسیرێکی ئاشکرا و وتەیەکی ڕوون و، بەڵگەیەکی یەکلایی کەرەوەی توندوتۆڵ و تەرجومانێکی ڕووناکی زات و سیفات و ناو و کاروبارەکانی خواوەندە.. هەروەها پەروەردەکاری جیهانی مرۆڤایەتی‌یە و.. وەك ئاو و ڕووناکیش وایە بۆ مرۆڤایەتیی گەورە کە ئیسلامەتی‌یە.. هەروەها وەك دانایی ڕاستەقینەیە بۆ جۆر و ڕەگەزی مرۆڤ، ڕابەر و ڕێ پیشاندەریشیانە بۆ ئەو شتانەی کە مرۆڤیان لە پێناودا دروست کراوە.. هەروەها قورئان وەك کتێبی شەریعەتە بۆ مرۆڤ، کتێبی دانستیشە.. هەروەك کتێبی دوعا و بەندایەتی‌یە، بە هەمان جۆر کتێبی فەرمان و بانگەوازیشە.. هەروەك کتێبی زیکرە، کتێبی فیکریشە.. هەروەك تەنها یەك کتێبە، بەڵام لە بەرامبەر پێویستی‌یە مەعنەوی‌یەکانی مرۆڤەوە چەندین کتێبی تێدایە.. هەروەها ئەم قورئانە وەك مەنزڵێکی پیرۆزی پڕ لە نامە و کتێب وایە، بە ڕادەیەك کە بۆ مەشرەبی هەر یەکە لە ئەهلی مەشرەبە جۆراوجۆرەکان و ڕێبازی هەر یەکە لە خاوەنی ڕێبازە جیاجیاکان، لە ئەولیا و صیددیقان و خواناسان و زانا لێکۆڵەرەکان، بۆ هەر یەك لەمانە، نامەیەکی پیشان داوە کە شیاوی چێژی مەشرەبەکەی ئەو بێت و، ئەو مەشرەبەی پێ ڕووناك بێتەوە و لەگەڵ ڕێڕەوی ڕێبازەکەی‌دا بگونجێت، بە ڕادەیەك کە دەڵێی ئەم قورئانە لە کۆمەڵە نامەیەك پێکهاتووە!

◆ سەیری ڕوونکردنەوەی بریسکانەوەی ئیعجاز بکە لە دووپات کردنەوەکانی قورئاندا، کە نەفامان، بە خەیاڵی خۆیان، بە ناتەواویی لە قەڵەم دەدەن لە ڕەوانبێژیی قورئاندا:

بزانه كه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی قورئان كتێبی زیكر و دوعا و بانگه‌وازه، ئه‌وا دووپات بوونه‌وه‌ی جوانتر و ره‌وانتر و ته‌نانه‌ت پێویستتره. كه‌واته به‌و جۆره نی‌یه كه نه‌فامان و كه‌سانی بیركورت گومان ده‌به‌ن. چونكه زیكر دووپات ده‌بێته‌وه و، دوعا ده‌وترێته‌وه و بانگه‌وازیش جه‌ختی له‌سه‌ر ده‌كرێته‌وه، ئه‌مه‌ش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه دووپات بوونه‌وه‌ی زیكر رووناكی ده‌به‌خشێت و، به وتنه‌وه‌ی دوعا و دووپات بوونه‌وه‌ی بانگه‌وازیش، دوعا كه جێگیر ده‌بێت و بانگه‌وازه‌كه‌ش جه‌ختی له‌سه‌ر ده‌كرێت.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه قورئان ده‌رمان و شیفای هه‌موو كه‌سێكه له هه‌موو كاتێكدا و، هه‌موو كه‌سێكیش له هه‌موو كاتێكدا بۆی نالوێت كه هه‌موو قورئان بخوێنێته‌وه، ئه‌و خواوه‌ندی دانای میهره‌بان زۆربه‌ی مه‌به‌سته‌كانی قورئانی له زۆر سووره‌تدا، به تایبه‌ت له سووره‌ته درێژه‌كاندا، داناوه. به راده‌یه‌ك كه هه‌ریه‌ك له‌و سووره‌تانه وه‌ك قورئانێكی بچووكی لێ هاتووه و، به‌م جۆره رێگای بۆ هه‌موو كه‌سێك ئاسان كردووه بێ ئه‌وه‌ی كه‌س بێبه‌ش بكات. له‌به‌ر ئه‌وه، باسی "ته‌وحید" و "حه‌شر" و چیرۆكی "حه‌زره‌تی مووسا"ی - درودی له‌سه‌ر بێت - دووپات كردووه‌ته‌وه.

پاشان بزانه! هه‌روه‌ك پێویستی‌یه‌كانی له‌ش، به‌پێی كات ده‌گۆڕێن و جیاجیان، هه‌ر به‌و جۆره‌ش پێویستی‌یه مه‌عنه‌وی‌یه‌كانی مرۆڤ كاته‌كانیان جیاجیایه. ئه‌وه‌تا پێویستیی مه‌عنه‌ویی مرۆڤیش بۆ به‌شێكیان به وێنه‌ی پێویستیی له‌ش وایه بۆ "هه‌وا" و له هه‌موو چركه‌یه‌كدایه وه‌ك "هو الله" بۆ رۆح و، بۆ به‌شێكی تر له هه‌موو كاتێكدایه وه‌ك "بسم الله".. ئیتر به‌م جۆره ئه‌وانی تریش بۆ خۆت لێك بده‌ره‌وه.

كه‌واته دووپات بوونه‌وه‌ی ئایه‌ت و وشه‌كان بۆ ده‌رخستنی دووپات بوونه‌وه‌ی پێویستی‌یه و، ئاماژه‌یه بۆ زۆری و توندیی ئه‌و پێویستی‌یه، هه‌روه‌ها بۆ بێداركردنه‌وه و له‌خه‌و هه‌ڵساندنی ده‌ماری پێویستی‌یه و، بۆ شه‌وق دروستكردنی مرۆڤه بۆ ئه‌و پێویستی‌یه و، بۆ جووڵاندنی ئیشتیهای پێویستی‌یه سه‌باره‌ت به‌و خۆراكه مه‌عنه‌وی‌یانه.

بزانه كه: قورئان دامه‌زرێنه‌ری ئه‌م ئایینه گه‌وره و توندوتۆڵه و بنیاتنه‌ری بنچینه‌كانیه‌تی. هه‌روه‌ها بناغه‌كانی ئه‌م جیهانه ئیسلامی‌یه‌یه و، هه‌ڵگێڕ و ئاڵوگۆڕكه‌ری لایه‌نه كۆمه‌ڵایه‌تی‌یه‌كانی ژیانی گرۆی مرۆڤه و، وه‌ڵامی گشت پرسیاره دووپاتبووه‌كانی سه‌رجه‌م چین و توێژه جیاجیاكانی گرۆی مرۆڤی تێدایه كه چ به زمانی ده‌م و چ به زمانی حاڵ ده‌یانكه‌ن. خۆ دووپات كردنه‌وه‌ش كارێكی گه‌لێ پێویسته بۆ "دامه‌زرێنه‌ر"، تاكو

ئەوەی دایدەمەزرێنێت جێگیری بکات و.. پێویستی بە وتنەوەی یەك لە دوای یەك هەیە، تاکو ئەو شتەی مەبەستیەتی جەختی لەسەر بکات و پشتی بگرێت.

بزانە! کە قورئان لە بارەی چەند کێشەیەکی گەورەوە دەدوێت و، دڵان بانگ دەکات کە باوەڕیان پێ بکەن و.. چەند ڕاستییەکی وردیش ڕوون دەکاتەوە و داوا لە ژیرییەکان دەکات کە بیانزانن، کەواتە بۆ ئەوەی ئەم کێشانە لەناو دڵاندا دامەزرێنرێن و لە بیری زۆربەی خەڵکیشدا جێگیر بکرێن، پێویستە لە چەند شێوە و شێوازێکی جیاجیادا دووپات بکرێنەوە.

ئنجا بزانە کە هەموو ئایەتێکی قورئان بەر و پشت و سنوور و هەڵاتگە(مطلـــع)ی خۆی هەیە و، هەر چیرۆکێکیش چەندین حوکم و سوود و مەبەست و ڕووی تێدایە. دەبینیت لە جێگایەکدا لەبەر یەکێك لەو ڕووانە باس دەکرێت، بەڵام لە جێگایەکی تردا لەبەر ڕوویەکی تر، لە سوورەتێکدا لەبەر یەکێك لەو مەبەستانە باس دەکرێت، کەچی لە سوورەتێکی تردا لەبەر مەبەستێکی تر. کەواتە دووپاتبوونەوەکە، تەنها لە ڕواڵەتدایە.

❊ سەبارەت بەوەش کە قورئان باسی هەندێ بابەت و مەسەلەی گەردوونی بە کورتی و پوختی دەکات و، لە هەندێکی تریدا بە شێوەیەکی تەماوی دەدوێت، لە ڕاستیدا ئەم کارەی قورئان، بریسکەیەکی درەوشانەوەی ئیعجازە و، ئەهلی ئیلحاد بە هەڵەدا چوون کە بە وەهمی خۆیان ئەمەیان بە نەنگی لە قورئاندا داناوە و، کردوویانە بە جێی ڕەخنەیان.

◆ ئەگەر دەڵێیت:

بۆچی قورئان وەکو فەلسەفە و حیکمەت لە بارەی بوونەوەرانەوە نادوێت و، هەندێ مەسەلە بە کورتی باس دەکات و، هەندێکی تریشیان بە شێوازێك باس دەکات کە لەگەڵ هەست و بیری زۆرینەی خەڵکیدا بگونجێت و، بیریان ماندوو ناکات و ئازاریان نادات. بەڵکو لە ڕواڵەتدا زۆر بە ڕەوانی و ئاسایی باسیان دەکات؟

لە وەڵامدا دەڵێین:

چونکە فەلسەفە لە ڕێی حەق لایداوە و ڕێی لێ ون بووە!

دیارە بە حەتمی لەو دەرس و وتانەی پێشوو تێگەیشتیت لەوەی کە: قورئانی پیرۆز کاتێ باسی بوونەوەران دەکات، بۆ ئەوە باسیان دەکات کە بیانکات بە بەڵگە لەسەر زات و سیفات و ناوە جوانەکانی خوای گەورە. واتە: ناوەرۆك و واتاکانی کتێبی گەورەی گەردوون لە خەڵك تێدەگەیەنێت، تاکو بەدیهێنەری گەردوونیان پێ بناسێنێت. بەو واتایەی

كه قورئانی پیرۆز "بوونه‌وه‌ران" له پێناوی به‌دیهێنه‌ره‌كه‌یاندا به‌كار ده‌هێنێت، نه‌ك لـه پێنـاوی خودی ئه‌و به‌دیهێنراوانه‌دا! ئه‌مه سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه قورئـان لـه قسـه و گوفتـاری‌دا ڕوو لـه جه‌ماوه‌ر ده‌كات.

كه‌واته مادەم قورئان له باسه‌كانی‌دا بوونه‌وه‌ران بۆ ئه‌وه به‌كار ده‌هێنێـت كـه بیانكـات بـه به‌ڵگه له‌سـه‌ر به‌دیهێنـه‌ریان، ئـه‌وا مـه‌رجی "به‌ڵگـه" ئه‌وه‌یـه كـه لـه بـه‌رچاوی جـه‌ماوه‌ردا لــه "ئه‌نجام"ه‌كه‌ی ڕوون و ئاشكراتر بێت.

پاشـان مـادەم قورئـان ڕابـه‌ره، ئـه‌وا به‌لاغـه‌تی ڕابه‌رایـه‌تی كردن له‌وه‌دایـه كـه له‌گـه‌ڵ بیركردنه‌وه و ڕوانینی عه‌وام(زۆرینه)ی خه‌ڵكی‌دا بڕوات و، هه‌سته‌كانیان ڕه‌چـاو بكـات و، بێزاری له بیری جـه‌ماوه‌ردا لاببـات، تاكـو ڕوانینیـان بـه بێ‌هـووده و بـێ سـوود گرفتـاری بێزاری و نه‌شـازی نـه‌بێت و، بیركردنه‌وه‌شیان چه‌واشـه نـه‌كات و، هه‌ستیان - بـه بـێ هیـچ سوودێك - په‌رته‌وازه نه‌بێت..

كه‌واته ڕه‌وانترین گوفتارێك ئاراسته‌ی ئه‌وان بكرێت و، باشترین ڕێنمایی بۆیان ئه‌وه‌یه كه ئاشكرا و ئاسان و كورت بێت، تاكو به ئاسانی لێی تێ‌بگه‌ن و لێی بێزار نه‌بن و، له‌و شتانه‌دا كـه ئـه‌وان پێویستیان بـه درێژه‌پێدانـی نی‌یـه، ئـه‌م بـه كورتـی بۆیـان بـاس بكـات و، بـۆ شـته ورده‌كانیش نموونه بهێنێته‌وه، تاكو به‌م كاره له تێگه‌یشتنی ئه‌وان نزیكیان بخاته‌وه.

جـا لـه‌به‌ر ئـه‌وه‌ی كـه قورئـان ڕابـه‌ره بۆ هـه‌موو چینـه‌كانی مرۆڤایـه‌تی، ئـه‌وا به‌لاغـه‌تی ڕابه‌رایه‌تی وا پێویست ده‌كات كـه شـتێك بـاس نـه‌كات زۆربـه‌ی خـه‌ڵك بخاتـه هه‌ڵـه‌كاری و سه‌رپێچی كردنه‌وه سه‌باره‌ت بـه‌و شتانه‌ی كـه بـه گوێـره‌ی ڕواڵـه‌تبینیی خۆیـان بـه به‌دیـهیی ده‌زانن و، ئه‌و شته هه‌ست پێ كراو و باوانه‌ی ناو ئـه‌وان - بـه بـێ هیـچ پێویسـت كردنێـك بـه گۆڕیـن - نـه‌گۆڕڕێن و، ئـه‌و شـتانه‌ش كـه ئـه‌وان لـه كـار و فه‌رمانبـه‌ری و ئه‌ركـه سه‌ره‌كی‌یه‌كه‌یاندا پێویستیان پێیان نی‌یه، ئه‌م هه‌ر باسیان نه‌كات، یان ئه‌گه‌ر باسیشی كـردن، به پوختی له باره‌یانه‌وه بدوێت..

بۆ نموونه:

قورئان باسی "خۆر" ده‌كات، به‌ڵام نه‌ك له‌به‌ر خۆر خۆی و چییه‌تی‌یه‌كـه‌ی، بـه‌ڵكو له‌بـه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ی كه ڕووناكی كردووه‌ته‌وه و كردوویـه‌تی بـه چـرا و، لـه‌باره‌ی كارمه‌ندی‌یه‌كـه‌ی خۆره‌وه ده‌دوێـت كـه له‌وه‌دایـه بـووه بـه ته‌وه‌ره‌یـه‌ك بـۆ ده‌رخسـتنی سـنعه‌تی كردگـار و ڕێكوپێكیی به‌دیـهێنراوان. خـۆ ڕێكخسـتن و ڕێكوپێكیـش بریتیـن لــه چـه‌ند ئاوێنه‌یـه‌ك كـه به‌دیهێنه‌ری مه‌زنمان پێ ده‌ناسێنن.

کەواتە قورئان بە پیشاندانی ڕێکوپێکی لە تان و پۆی چنینی بەدیهێنراواندا، کەمالاتی بەدیهێنەری دانا و زانامان پێ دەناسێنێت و، کە دەفەرموێ: ﴿والشَّمْسُ تجـــري﴾ (یــس:٣٨) تێمان دەگەیەنێت و بێدارمان دەکاتەوە بۆ هەڵسوکەوتەکانی توانستی گەورەی خواوەند لە جیاوازیی نێوان شەو و ڕۆژ و، یەك لە دوای یەك هاتنی هاوین و زستاندا. بەم سەرنج ڕاکێشانەش گوێبیست بۆ گەورەیی دەسەڵات و توانای کردگار و یەکتایی لە پەروەردگاری‌یەکەی خوادا بێدار دەکاتەوە. جا ئیتر ڕاستیی هاتوچۆی خۆر هەرچۆن و بە هەر شێوەیەك بێت، هیچ کارێك ناکاتە سەر مەبەستەکەی قورئان، کە بریتی‌یە لە پیشاندان و دەرخستنی ئەو ڕێکخستنە دیار و چنراوە(منسوج)ی کە لە کاروباری خۆردا هەیە.

هەروەها دەفەرموێ:

﴿وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِراجاً﴾ (نوح:١٦)..

کە قورئان وشەی: "سراج" لەم دەستەواژەیەدا بەکاردەهێنێت، جیهان لە شێوەی کۆشکێکدا دەردەخات و، کەرەسەکانی ناو جیهانیش لە شێوەی پێداویستی‌یەکانی ناو ئەو کۆشکەدا پیشان دەدات و، شتە ڕازاوەکان و خۆراکەکانی ناویشی بە هی دانیشتووان و میوانەکانی ناو ئەو کۆشکە لە قەڵەم دەدات و، لەو دەربڕینەدا وا لە مرۆڤ دەکات کە هەست بکات و پەی بەوە ببات کە دەستێکی ڕەنگین و سەخاوەتمەند و میهرەبان بۆ میوانەکان و خزمەتگوزارەکانی ناو ئەو کۆشکە ئامادەی کردوون. "خۆر"یش لەو کۆشکەدا بریتی‌یە لە کار پێ‌سپێرراوێکی بەردەست و چرایەکی ڕووناککەرەوە.

کەواتە بەکارهێنانی وشەی "سراج" لەم گوزارشتەدا، مرۆڤ بۆ بەزەیی و میهرەبانیی بەدیهێنەر لە نێوان گەورەیی پەروەردگاریتی‌یەکەیدا بێدار دەکاتەوە و، مرۆڤیش لە چاکەکاری‌یەکانی ئەو خواوەندە لە نێوان فراوانیی میهرەبانی‌یەکەیدا تێ‌دەگەیەنێت و، وایان لێ دەکات کە هەست بەو سەخاوەتمەندی‌یانەی خواوەند بکەن کە لە گەورەیی پادشایی‌یەکەیدا هەیە.

ئنجا ئێستا گوێ لەو مرۆڤە فەلسەفی‌یە زۆربلێ‌یە ڕابگرە، بزانە لە بارەی خۆرەوە چی دەڵێت ؟

ئەوەتا دەڵێت :

(خۆر پارچەیەکی زەبەلاحی تواوەی ئاگرە و، هەر لە جێی خۆی بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە و، چەند پزیسکێکی لێ جیا بووەتەوە، کە بریتین لە زەوی‌یەکەمان و هەسارە

گەرِۆکەکانی تر. جا ئەم قەبارە گەورە و جیاجیانەش، کە یەکجار زەبەلاحن، گەورەیی‌یان ئەوەندەیە و.. ماهییەتیان ئەوەیە).

جا برِوانە ئەم مەسەلەیە جگە لە سەرسوورِمان و واق ورِمان چ سوودێکی پێ گەیاندیت؟

خۆ نە کەمالێکی زانستی و، نە چێژێکی رِۆحی و، نە ئامانجێکی ئادەمی‌یانە و، نە سوودێکی ئاینیی پێ نەگەیاندیت..

لەمەوە قیاس و بەراوردی مەسەلەکانی تریش بکە، تاکو نرخ و بەهای ئەو مەسەلە فەلسەفی‌یانە بزانیت کە بە رِوالەت شتێکی رِازاوەن، کەچی لە رِاستی‌دا ناوەرِۆکەکەیان نەزانی‌یەکی خالی و بەتاڵە!

کەواتە با زرق و برقە رِواڵەتی‌یەکەی فەلسەفە لە خشتەت نەبات و، هەرگیز پشت لە رِوونکرنەوەکانی قورئانی خاوەن ئیعجاز هەڵنەکەیت.

اللّهم اجعل القرآن شفاءً – لنا ولكاتبه وأمثاله – من كل داء ومؤنساً لنا ولهم في حياتنا وبعد موتنا، وفي الدنيا قريناً، وفي القبر مونساً، وفي القيامة شفيعاً، وعلى الصراط نوراً، ومن النار ستراً وحجاباً، وفي الجنة رفيقاً، والى الخيرات كلها دليلاً وإماماً، بفضلك وجودك وكرمك ورحمتك يا أكرم الأكرمين ويا أرحم الراحمين. آمين.

اللّهم صلّ وسلم على مَن اُنزل عليه الفرقان الحكيم وعلى آله وصحبه أجمعين. آمين. آمين.

**بێداری:**

لەو چل جۆرانەی ئیعجازی قورئان پازدە جۆرمان لە "مەسنەویی نووری"دا باس کردووە، لە شەش دلۆپی نمی چوارەم، بە تایبەت لە شەش سەرنجە وردەکانی دلۆپی چوارەمدا. لەبەر ئەوە لێرەدا بە کورتی باسمان کردن. جا هەر کەسێك دەیەوێت بە درێژی ئاگادار بێت، با سەرێك لەوێ بدات.

# وتەی بیستەم

بریتی‌یە لـە دوو مەقام

## مەقامی یەکەم

بسم الله الرحـــمن الرحیم

﴿وَإِذْ قُلْنا لِلْملــئِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ﴾ (البقرة:٣٤)

﴿إِنَّ اللهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً﴾ (البقرة:٦٧)

﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُمْ مِنْ بَعْدِ ذلِكَ فَهِيَ كَالْحِجارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ (البقرة:٧٤)

ڕۆژێکیـان ئـەم ئایەتـە پیرۆزانـەم دەخـوێندەوە. یەکســەر لـە ڕێژنـەی نـووری قورئـانی پیرۆزەوە و لـە نێوان "سێ سـەرنج"دا ئیلـهامێك لـە ڕووی دڵمـدا کرایـەوە. تـاکو ڕێ لـە وەسوەسە و چرپە و خەیاڵ و ختوورەکانی شەیتان بگرێت.

شێوەی گومانەکەش، کە شەیتان هاویشتی، بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

وتی: ئێوە دەڵێن قورئـان ئیعجازبەخشە و لــە چڵەپۆپـەی ڕەوانبێژی‌دایـە و لــە هـەموو کاتێکیشدا ڕێنمایی‌یە بۆ هەموو جیهانەکان.. بەڵام ئایا بۆچی چەند ڕووداوێکی جوزئی باس دەکـات و بــە چەشـنی ڕووداوی مێژوویـی دەیانگێڕێتـەوە و بـە جـەخت لەسـەر کردنـەوە دووپاتیـان دەکاتـەوە؟ هـەروەها چی داخـوازی ئەوەیـە کـە ڕووداوێکـی جوزئیـی چەشـنی "سـەربڕینی مانگایـەك" لـە نـاوەندی گەلـێ وەسفی گرنگدا بـاس بکرێـت بـە ڕادەیـەك کـە سوورەتەکەش هەر بە ناوی "البقرة"وە ناو بنرێت؟

پاشـان قورئـان بـە گشتی ڕێنمایی کەسـانی ژیر و هۆشمـەند دەکـات و لـە زۆر شـوێنیدا دەفەرموێ: ﴿**أفــلا يعقلـون**﴾ واتـە کارەکـان بـۆ ژیـری دەگێڕێتـەوە.. کـەچی ڕوودانـی سوژدەبردنی مەلائیکـەتان بـۆ حـەزرەتی ئـادەم – دروودی لەسـەر بێـت – کـارێکی سـەرتاپا غەیبی‌یە و هیچ ڕێگایەك نی‌یە کە ژیری بەهۆیـەوە پـەیی پێ ببـات، مەگـەر بـە تەسلیم بـوون و ملکەچی‌یەك کە دوای ئیمانێکی بەهێزی دامەزراو مرۆڤ بەدەستی بهێنێت؟

پاشان كامه‌یه ڕووی "هیدایه‌ت" له‌و باسانه‌ی قورئاندا كه له باره‌ی چه‌ند حاڵه‌ت و دۆخێكی سروشتیی ئه‌وتۆوه ده‌دوێت كه به "ڕێكه‌وت" دێنه ڕێی به‌رده‌كان؟ ئایا بۆچی گرنگی‌یه‌كی له‌ڕاده‌به‌ده‌ریان پێ ده‌دات؟

ئه‌مه شێوه‌ی گومانه‌كه‌ی شه‌یتان بوو.

شێوه‌ی ئه‌و سه‌رنجانه‌ش كه ئیلهام كران. ئه‌مانه‌ی خواره‌وه بوون:

❑ **سه‌رنجی یه‌كه‌م:**

قورئانی "دانا" چه‌ندین ڕووداوی جوزئیی تێدایه. به‌ڵام له پشتی هه‌موو یه‌كێ له‌و ڕووداوانه‌وه ده‌ستوورێكی هه‌مه‌كیی مه‌زن دانراوه و، ئه‌و ڕووداوه هه‌نده‌كی‌یانه‌ش بۆیه باس ده‌كرێن چونكه به‌شێكن له یاسایه‌كی گشتی و شمووڵی و هه‌مه‌كی.

بۆ نموونه: ئایه‌تی پیرۆزی: ﴿وَعَلَّمَ آدمَ الأَسماءَ كُلَّها﴾ (البقـــرة:٣١) ڕوونی ده‌كاته‌وه كه فێركردنی ناوه‌كان(تعليم الاسماء) یه‌كێكه له موعجیزاتی حه‌زره‌تی ئادەم – دروودی له‌سه‌ر بێت – تاكو توانا و لێهاتنی ئه‌و بۆ "جێ‌نشینیی سه‌ر ڕووی زه‌وی" له به‌رچاوی مه‌لائیكه‌تاندا ئاشكرا بكرێن. جا ئه‌م ڕووداوه هه‌رچه‌ند هه‌نده‌كی‌یه، به‌ڵام چمكێكه له ده‌ستوورێكی هه‌مه‌كی‌دا، كه بریتی‌یه له‌وه‌ی:

مرۆڤ، كه خاوه‌نی توانا و لێهاتنێكی زه‌به‌نده و گشتی‌یه، له ڕێی فێربوونی هونه‌ر و زانسته زۆر و له‌ژماره‌به‌ده‌ره‌كانه‌وه، كه سه‌رجه‌م بوونه‌وه‌ران ده‌گرنه‌وه و، فێربوونی ئه‌و زانیاری‌یه زه‌به‌ندانه‌ی كه شمووڵی سه‌رجه‌م سیفات و كاروباره پڕ له دانسته‌كانی به‌دیهێنه‌ری به‌خشنده ده‌كه‌ن، توانیی له‌م ڕێ‌یه‌وه له هه‌ڵگرتنی ئه‌مانه‌تی هه‌ره مه‌زندا پله‌ی "باشترین" نه‌ك هه‌ر ته‌نها به‌سه‌ر مه‌لائیكه‌تدا به‌ڵكو به‌سه‌ر ئاسمانه‌كان و زه‌وی و چیاكانیشدا به‌ده‌ست بهێنێت.

هه‌روه‌ك قورئان باسی خه‌لافه‌تی مه‌عنه‌ویی مرۆڤ ده‌كات له‌سه‌ر زه‌وی‌دا، ده‌ریشی‌ده‌خات كه ڕووداوی جوزئی و غه‌یبیی سوژده‌بردنی مه‌لائیكه‌تان و سوژده‌نه‌بردنی شه‌یتان بۆ حه‌زره‌تی ئادەم، چمكی ده‌ستوورێكی بینراوی هه‌مه‌كی و یه‌كجار فراوانه. له هه‌مان كاتیشدا ڕاستی‌یه‌كی مه‌زن ڕوون ده‌كاته‌وه كه بریتی‌یه له‌وه‌ی: قورئان كاتێ باسی گوێڕایه‌ڵیی مه‌لائیكه‌ت بۆ خودی حه‌زره‌تی ئادەم و خۆ به‌گه‌وره‌زانین و ملنه‌دانی شه‌یتانیش بۆ سوژده‌بردن ده‌كات، ده‌یه‌وێ خه‌ڵكی تێ‌بگه‌یه‌نێت كه زۆربه‌ی بوونه‌وه‌ره ماددی‌یه‌كان و ئه‌وانه‌ش كه وه‌كیل و نوێنه‌ری ڕۆحانیی ئه‌وانن، تێكڕا ئاماده و ڕام كراون بۆ سوودگه‌یاندنی ته‌واوه‌تی به سه‌رجه‌م هه‌ست و نه‌سته‌كانی مرۆڤ و، هه‌موویان ملكه‌چ و گوێڕایه‌ڵی مرۆڤن.. هه‌روه‌ها خه‌ڵكی تێ‌ده‌گه‌یه‌نێت كه ته‌نها مادده زیانبه‌خشه‌كان و نوێنه‌ر و دانیشتووه

چەپەڵەکانی ئەو ماددە زیانبەخشانەن کە توانا و لێهاتنی سروشتیی مرۆڤ تێکدەدەن و لە ڕێ دەیترازێنن و بەرەو خراپکاری و گومڕایی دەیدەنەبەر. ئەمەش وا لەو ماددانە دەکات کە ببن بە دوژمنی سامناکی مرۆڤ و، تەگەرەی گەورە لە ڕێی بەرزبوونەوەی مرۆڤدا بەرەو کەماڵات، دادەنێن.

جا کاتێ کە قورئانی پیرۆز ئەم گفتوگۆیە لەگەڵ حەزرەتی ئادەمدا - کە تەنها یەك کەسە و ڕووداوەکەش جوزئییە - ساز دەکات، لە ڕاستیدا بەمە گفتوگۆیەکی بەرز و بڵندی لەگەڵ سەرانسەری بوونەوەران و سەرجەمی گرۆی مرۆڤدا ساز داوە.

**❑ سەرنجی دووهەم:**

ئاشکرایە کە زەوییەکانی "میسر" وشك و برنگ و ڕووتەڵن، چونکە بەشێکن لە "بیابانی مەزن". کەچی بەهۆی پیت و بەرەکەتی ڕووباری نیلەوە گەلێ داهاتی زۆر بەرهەم دەهێنن، بە ڕادەیەك کە دەڵێی ئەو زەوییە وشك و برنگانە مەزرایەکن هەمیشە داهاتی زۆر بە دانیشتوانی ئەوێ دەبەخشن. لەبەر ئەوە، بوونی ئەم بەهەشتە فراوانە لە تەنیشتی ئەو بیابانە وشکەی کە پزیسکی ئاگری لێ دەبێتەوە، کارێکی وای کردووە کە "جووتیاری" و "کشتوکاڵ" لای خەڵکی میسر گەلێ پەسەند و مایەی حەز لێکردن بێت، بە ڕادەیەك کە لە سروشت و هەستیاندا ڕۆچووە. تەنانەت ئەو حەز و خۆشەویستییەیان بۆ کشتوکاڵ، جۆرە بەرزی و قودسییەتێکی بە کشتوکاڵ و پاشان بە هۆکارەکانی کشتوکاڵیش (وەك: گا و مانگا) بەخشیوە. بە ئەندازەیەك کە خەڵکی میسری ئەو ڕۆژگارە تا ڕادەی "پەرستن" ڕێز و قودسییەتیان بۆ گا و مانگا دانابوو. جا نەوەی ئیسرائیلیش کە لەم ناوچەیەدا و لە باوەشی ئەم ژینگە و دەوروبەرەدا گەشەیان کردبوو، هەندێ شتیان لە سروشتی خەڵکی ئەوێ وەرگرتبوو، وەك لە ڕووداوی بەناوبانگی "گوێرەکە"کەوە هەستی پێ دەکرێت.

جا قورئانی پیرۆز بە باسی سەربڕینی تەنها یەك مانگا تێماندەگەیەنێت کە حەزرەتی مووسا - دروودی لەسەر بێت - بە پێغەمبەرایەتییەکەی خۆی چەمکی "گا پەرستی"ی سەربڕی. ئەو چەمکەی کە ئاوێتەی دەماری نەتەوەکەی بووبوو، بە درێژایی ڕۆژگاریش لە توانا و لێهاتنیاندا پەرەی سەندبوو.

واتە قورئانی پیرۆز. بە جۆرێکی ئیعجازبەخش و لە ڕێی باسکردنی ئەم ڕووداوە هەندەکییەوە، دەستوورێکی هەمەکی و دەرس و پەندێکی پێویستی "دانایی" دەخاتە ڕوو، کە هەموو کەسێك لە هەموو کاتێکدا پێویستی پێی دەبێت.

کەواتە بە گوێرەی ئەمانەی باس کران، بۆ خۆت تێبگە لەوەی کە:

ئه‌و ڕووداوه‌ هه‌نده‌كی‌یانه‌ی به‌ شێوه‌ی ڕووداوی مێژوویی له‌ قورئـانی پـیرۆزدا بـاس كراون، هه‌ریه‌كه‌یان چمك و به‌شێكی چه‌ند ده‌ستوورێكی هه‌مه‌كی و گشتین كه‌ ئه‌و ڕووداوانه‌ ده‌ریانده‌خه‌ن. ته‌نانه‌ت هه‌موو ڕسته‌یه‌كی ئه‌و حه‌وت ڕستانه‌ی چیرۆكی حه‌زره‌تی مووسا - دروودی له‌سه‌ر بێت - كه‌ له‌ قورئاندا دووپات بوونه‌ته‌وه‌، ده‌ستوورێكی هه‌مه‌كیی مه‌زنی تێدایه‌. وه‌ك له‌ كتێبی "لوامع"دا ڕوونمان كردووه‌ته‌وه‌، گه‌ر حه‌ز ده‌كه‌یت سه‌ری لێ بده‌.

❑ **سه‌رنجی سێهه‌م:**

خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێ:

**﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُمْ مِنْ بَعْدِ ذلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْهارُ وَإِنَّ مِنها لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْماءُ وإِنَّ مِنها لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ الله وما الله بغافِلٍ عَمّا تَعْمَلُونَ﴾** (البقرة:٧٤).

كاتێ ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزانه‌م ده‌خوێنده‌وه‌، ئه‌و شه‌یتانه‌ی كه‌ وه‌سوه‌سه‌ی به‌ دڵدا ده‌هێنام. وتی:

باسكردنی چه‌ند حاڵه‌تێكی سروشتیی به‌ردی ئاسایی به‌ جۆرێك كه‌ وا بگه‌یه‌نێت مه‌سه‌له‌یه‌كی مه‌زن بێت، له‌ كاتێكدا كه‌ لای خه‌ڵكی شتێكی زانراوه‌، چ مانایه‌كی تێدایه‌؟ یان هۆكار و په‌یوه‌ندی له‌م باسه‌دا چی‌یه‌؟ چ داخواز و پێویستی‌یه‌ك بۆ باسكردنیان هه‌یه‌؟

یه‌كسه‌ر، بۆ به‌ربه‌ستی ئه‌م گومانه‌، له‌ ڕێژنه‌ی قورئانی پیرۆزه‌وه‌ ئه‌م ئیلهامه‌ بۆ دڵم هات:

به‌ڵێ.. په‌یوه‌ندی و، هۆكار و، داخواز و، پێویستی بۆ ئه‌م باسه‌ هه‌یه‌. ته‌نانه‌ت په‌یوه‌ندی‌یه‌كه‌ هێنده‌ به‌هێزه‌ و واتاكه‌ش ئه‌وه‌نده‌ گه‌وره‌یه‌ و ڕاستی‌یه‌كه‌ش وه‌ها مه‌زنه‌ كه‌ مه‌گه‌ر ته‌نها: ئیعجاز و پوختیی قورئانی پیرۆز و نه‌رمونیانیی قورئان له‌ ڕێنمایی‌دا، بتوانێت تێگه‌یشتنی بۆ مرۆڤ ئاسان بكات.

پوخته‌ لێدوان(الإيجاز) كه‌ یه‌كێكه‌ له‌ بناغه‌ گرنگه‌كانی ئیعجاز.. هه‌روه‌ها نه‌رمونیانی له‌ ڕێنمایی‌دا و جوانیی تێگه‌یاندن، كه‌ یه‌كێكن له‌ نووره‌كانی ڕێنمایی قورئانی پیرۆز، داخوازی ئه‌وه‌ن: ڕاستی‌یه‌ هه‌مه‌كی و ده‌ستووره‌ نادیار و ته‌ماوی‌یه‌ گشتی‌یه‌كان به‌ شێوه‌یه‌كی جوزئیی ئه‌وتۆ باس بكرێن كه‌ له‌گه‌ڵ ئولفه‌ت و ڕاهاتنی عه‌وام(گشتیی خه‌ڵكی)دا بگونجێت كه‌ زۆربه‌ی جه‌ماوه‌ری قسه‌ بۆكراوی قورئانی پیرۆزن. هه‌روه‌ها داخوازی ئه‌وه‌ن كه‌ ته‌نها چه‌ند چمك و وێنه‌یه‌كی ساده‌ و ساكاری ئه‌و ڕاستی‌یه‌ مه‌زنانه‌ بۆ بیر كردنه‌وه‌ی ساده‌ی ئه‌و عه‌وامانه‌ بخرێنه‌ ڕوو. جگه‌ له‌مانه‌ش ده‌بێ ئه‌و كارسازی‌یانه‌ی خوای گه‌وره‌ كه‌ له‌ ژێر

زەوی‌دا ڕوو دەدەن و کاری دەراسـای خـواوەندن و پـەردەی ڕاهـاتن و ئولفـەتیان بەسـەردا دراوەتەوە، بە شێوەیەکی کورت و پوخت باس بکرێن.

جا لەسەر ئەم بناغەیە، قورئانی پیرۆز لەم ئایەتانەدا دەفەرموێت:

ئەی نەوەی ئیسـرائیل و ئەی نەوەی ئادەم! چـی وای لـێ کـردوون کـە دڵانتـان ئەسـتوور بووە و لە بەرد ڕەقتریان لـێ هاتووە؟ خۆ ڕەقـترینی بـەردەکان، کـە چینێکـی گـەورەی بـەردی ڕەق پێکدەهێنن لـە ژێـر چینی گڵـی گـۆی زەوی‌دا، بـە تـەواوەتی گوێڕایـەڵی فەرمانـەکانی خواوەندن و، ملکەچی تەواوەتیی بـەڕێ‌کردنی کارەکـانی پـەروەردگارن. چونکـە هـەروەك "فەرمانەکانی خواوەند" لە پێکـهاتنی درەخـت و ڕووەکـەکاندا بـە ئاسـانی‌یەکی ڕەهـا بـەڕێ دەچن، بە هەمان جـۆر و هـەمان ئاسـانی و بەوپـەڕی ڕێکوپێکـی، فەرمانـەکانی خـواوەنـد لـەو بـەردە ڕەق و تەقانـەی ژێـر زەویشـدا بـەڕێ دەچـن و جێ‌بـەجێ دەکرێـن. تەنانـەت جۆگـە و دەمارەکانی ئاوی ژێر زەوی، بەوپەڕی ڕێکوپێکـی و دانـایی تـەواوەتی و بێ هیـچ بـەرگری و تەگەرەیەك لە لایەن ئەو بەردانەوە و، بە چەشنی هاتوچۆی خوێنی ناو دەمارەکـانی لـەش، کـە هیـچ بەربەسـت و ڕێگرێکیـان لـە ڕێ‌دا نی‌یـە، لـە نـاوەندی ئـەو بەردانـەوە بـەخوڕ دێـن و دەڕۆن[1].

پاشان بە فەرمانێکی پەروەردگاری و بەوپەڕی ڕێکوپێکی، ڕەگە باریك و نیانەکان سەوز دەبن و لەناو ئەو بەردە ڕەقانەی ژێر زەوی‌دا جێی خۆیان دەکەنەوە و بڵاو دەبنەوە، بێ ئـەوەی هیچ ڕێگرێك بێتە بەردەمیـان. ئیتر بە چەشـنی ئاسـانیی بـڵاو بوونـەوەی لـق و پـەلی ڕووەك و درەختەکان لە هەوادا، ئەوانیش لەناو ئەو بەردانەدا ئاوا بە ئاسانی بڵاو دەبنەوە!

جـا قورئـانی پـیرۆز، بـەم ئایەتـە مەزنـەی خـۆی، پەنجـە بـۆ ڕاسـتی‌یەکی گەلــێ فـراوان

---

(١) بەڵێ، بەردی سەرگۆشەی کۆشکی گەڕۆك و بەسام و شکۆی "زەوی" ئەو چینە بەردانەیە. چونکە بەدیهێنـەری مـەزن سێ ئەرکی مـەزنی بـەو چینـە سـپاردووە. تەنـها قورئـانی پـیرۆزیش شـایانی ئەوەیـە کـە ئـەو سـێ ئـەرك و کارمەندی‌یانە ڕوون بکاتەوە.

کارمەندیی یەکەم: ئەرکی پەروەردە کردن و پێ‌گەیاندنی "گڵ"ە لە باوەشی‌دا بەهۆی توانستی خواوەندەوە، کە پاشان بە توانستی پەروەردگار ئەو گڵەش ئەرکی دایکایەتی بۆ ڕووەکەکان دەگرێتە ئەستۆ.

کارمەندیی دووهەم: بواردان بە هـاتوچۆی ئـاو - بـە شێوەیەکی ڕێکوپێـك - لـە جەستەی گۆی زەوی‌دا. کە کتومت وەکو هاتوچۆی خوێن وایە لە لەشی مرۆڤدا.

کارمەندیی سروشتیی سێهەم: ئـەرکی عـەمبارکردنی ڕووبـار و کانیاوەکانـە - چ لەسـەر پشـتی زەوی‌دا چ لـە شێوەی بەردەوام کردنی ئەو ڕووبار و کانیاوانە - بەپێی پێوەرێکی وردی ڕێکوپێك.

بەڵێ، بەردەکان، بە هەموو هێزێکیان و پڕ بە دەمیـان، بـەو ئـاوە ژیانبەخشـەی کـە لـە دەمیانـەوە هـەڵدەقوڵێت، بەڵگەکانی "یەکتایی" لەسەر زەوی‌دا پەخش دەکەن و لە ڕووی‌دا دەینەخشێنن. (دانەر)

ڕاده‌كێشێت و ڕێنمایی خه‌ڵكی بۆ لا ده‌كات و به‌ هێما كردن بۆ ئـه‌و ڕاستی‌یه‌، بـه‌م جۆره‌ی خواره‌وه‌ له‌گه‌ڵ دڵه‌ ڕه‌قه‌كاندا ده‌دوێت:

ئه‌ی نه‌وه‌ی ئیسرائیل و ئه‌ی نه‌وه‌ی ئاده‌م! ئه‌م دڵانه‌ چین كه‌ لـه‌ خۆتـاندا هـه‌ڵتان گرتوون؟ له‌ كاتێكدا كـه‌ ئێـوه‌ لـه‌ نـاوه‌ندی هـه‌ژاری و كۆڵـه‌واریی خۆتـاندا نوقـم بـوون! ئه‌مانـه‌ چۆن دڵێكـن كـه‌ بـه‌ تونـدی و ڕه‌قـی بـه‌رگری لـه‌ فـه‌رمانی خواوه‌ندێكـی هێنـده‌ مـه‌زن ده‌كـه‌ن كـه‌ ته‌نانـه‌ت چینـه‌ ڕه‌ق و مه‌زنـه‌كانی بـه‌رده‌كانیش ملـی بـۆ كـه‌چ ده‌كـه‌ن و بـێ گوێبی هیـچ فـه‌رمانێكی ناكـه‌ن، بـه‌ڵكو هـه‌موو یـه‌كێكی ئـه‌وان لـه‌ تاریكستـانی نـاو زه‌وی‌دا به‌وپـه‌ڕی گوێڕایـه‌ڵی و ملكـه‌چیی تـه‌واو، ئـه‌ركی بـه‌رزی خـۆی ڕاده‌پـه‌ڕێنێت. ته‌نانـه‌ت ئـه‌و به‌ردانـه‌ ئه‌ركی "گه‌نجینه‌" و "عه‌مبار"یـان گرتووه‌تـه‌ ئه‌ستۆ سـه‌باره‌ت بـه‌ داخوازی‌یـه‌كانی ژیـانی ئـه‌و زینده‌وه‌رانه‌ی كه‌ له‌سـه‌ر خـاكی زه‌وی‌دا ده‌ژیـن. بـه‌ ڕاده‌یـه‌ك ئـه‌و بـه‌رده‌ ڕه‌ق و ته‌قانـه‌ لـه‌ناو ده‌ستی توانستی دانا و مه‌زنی خواوه‌نددا له‌ نه‌رمی‌دا وه‌ك مێوی هه‌نگوینیان لـێ دێت و، ده‌بن به‌هۆی چه‌ند دابـه‌ش كردنێكی دادگه‌رانه‌ی ئه‌وتۆ كـه‌ بـه‌ دانـایی ئـه‌نجام ده‌درێـن.. بگـره‌ ئـه‌و به‌ردانه‌ له‌ ده‌ستی ئه‌و توانسته‌دا هێنده‌ نـه‌رم ده‌بـن كـه‌ بـه‌ چه‌شـنی ناسـكیی سـروه‌ی هـه‌وا، بـه‌ ده‌سته‌وه‌ دێـن و گوێڕایـه‌ڵی فـه‌رمان ده‌بـن. بـه‌ڵێ، هـه‌موو یـه‌كێ لـه‌و به‌ردانــه‌ هه‌میشـه‌ لـه‌ سوژده‌یه‌كی به‌رده‌وامدایه‌ له‌ به‌رده‌م مه‌زنیی توانستی خواوه‌ندی كردگاری‌دا.

هـه‌ر خـودی ئـه‌م به‌دیـهاتووه‌ ڕێكوپێـك و پـڕ لـه‌ ورده‌كاری‌یانـه‌ی كـه‌ لــه‌ ڕووی زه‌وی‌دا ده‌یـانبینین و ئـه‌و كارسازی‌یه‌ دانـا و چاودێری‌یانـه‌ی خواوه‌ندیـش كـه‌ به‌سـه‌ر زه‌وی‌دا تێپـه‌ڕ ده‌بن، له‌ ژێر زه‌ویشدا – به‌ هه‌مان جـۆر – ڕووده‌ده‌ن و بـه‌دی ده‌هێـنرێن. ته‌نانـه‌ت حیكمـه‌تی خواوه‌نــد و چــاودێریی پــه‌روه‌ردگار له‌مانــه‌ی ژێــر زه‌وی‌دا گه‌لــێ سه‌رســووڕهێنه‌رتر ده‌رده‌كه‌وێت و ڕێسا و دانستی زۆر سه‌یر و ناوازه‌تریان تێدا ده‌بینرێت له‌ چاو ئه‌وانه‌ی ڕووی زه‌وی‌دا.

بـه‌ وردی سـه‌رنج بـده‌ن! ئـه‌وه‌تا گـه‌وره‌ترین و ڕه‌قـترین بـه‌رد لــه‌ به‌رامبــه‌ر فه‌رمانـه‌ ته‌كوینی‌یه‌كانی خواوه‌نده‌وه‌ له‌ نه‌رمونیانی‌دا به‌ وێنه‌ی مۆمیـان لـێ دێـت و، هیـچ بـه‌رگری و سـه‌ختی‌یه‌ك نانوێنن له‌ ئاسـت كارمه‌نده‌كانی خواوه‌نـددا كـه‌ ئـاوه‌ ناسـك و ڕه‌گ و ده‌ماره‌ ورد و نیان و ئاوریشمی‌یه‌كانن! به‌ ڕاده‌یه‌ك كه‌ ده‌ڵێی هه‌ریه‌ك له‌و به‌ردانه‌ دڵی عاشقێكن كه‌ ته‌نها به‌ په‌نجه‌ لـێدانی ئه‌و ناسكۆڵانه‌ كه‌رت ده‌بێت و له‌به‌ر پێیاندا ده‌بێت به‌ خاك!

هه‌روه‌ها ئایه‌تی پیرۆزی: ﴿**وإنَّ منها لَمَا يهبطُ مِن خشــــيةِ اللهِ**﴾ (البقــرة:٧٤) چمكێكـی ڕاستی‌یه‌كی گه‌لـێ مه‌زن ده‌رده‌خات. كه‌ بریتی‌یه‌ له‌وه‌ی:

چیاکانی سەر ڕووی زەوی، کە دوای ئەوەی لە دۆخی شلیدا بوون و پاشان بەستیان و بوون بە چەند بارستاییەکی مەزنی بەردی ڕەق و تەق، تەنها بە چەند درەوشانەوەیەکی "جەلالییەت"ی خواوەند ورد و خاش دەبن، کە ئەمەش لە شێوەی بوومەلەرزە و ئالوگۆڕەکانی لە مەڕ زەویدا دەردەکەون. بە وێنەی ورد و خاش بوونی ئەو شاخەی کە لەسەر داواکاریی حەزرەتی مووسا بۆ بینینی خواوەندی مەزن، پەروەردگاری لێ درەوشایەوە و ورد و خاش بوو.

جا ئەو بەردانە لە سام و مەترسیی دەرکەوتنی "درەوشانەوە جەلالییەکان"ی خواوەندا، لە لوتکەی ئەو چیا بەرزانەوە تلێر دەبنەوە و ورد و خاش دەبن. ئنجا هەندێکیان دەبن بە گڵ و پاشان ڕووەکەکانیان لێ پێ دەگات و.. بەشێکی دیکەشیان لە شێوەی بەرددا دەمێننەوە و بەرە و شیو و دۆڵەکان تلێر دەبنەوە و دەشت و دەر دەگرنەوە و، ئنجا دانیشتووانی زەویش لە گەلێ کاری سوودبەخشی وەك دروستکردنی خانووبەرەدا بەکاریان دەهێنن. جگە لەو کاروبار و حیکمەت و سوودە زۆرانەش کە لای ئێمە پەنهانن. کەواتە بەردەکان هەمیشە لە سوژدە و گوێڕایەڵیی توانستی خوادان و ملکەچی تەواوەتیی دەستوورەکانی دانستی پەروەردگارن.

بێ گومان دەست هەڵگرتنی ئەو بەردانە لە جێگا بەرزەکانیان لە تاو سام و مەترسییان لە خواوەند و، نیشتەجێبوونیان بەوپەڕی تەوازوعەوە لە جێگا نزمەکاندا و بوونیان بەهۆی بەرهەم هێنانی گەلێ سوودی مەزنی جۆراوجۆر، ئەم کارانە هەرگیز بە هەڕەمەکی و بێ مەبەست ڕوو نادەن و کاری ڕێکەوتی کتوکوێر نین. بەڵکو بە کارسازیی پەروەردگارێکی بەتوانای دانا ئەنجام دەدرێن کە بە ڕێکوپێکی و دانایی ئەو ئالوگۆڕەیان بەسەردا دەهێنێت، هەرچەند بە ڕواڵەت نارێك دیار بن.

بەڵگە و شایەتی بێگومانیش لەسەر ئەو سوودانەی کە لە وردوخاش بوونی بەردەکانەوە بەدەست دێن: کەماڵی ڕێکوپێکی و جوانیی سنعەتە لەو پۆشاکانەدا کە دەکرێنە بەر ئەو چیایانەی بەردەکانیان لێوە تلێر دەبنەوە، کە بە گوڵزاری ناسك و نیان و بەروبوومی جوان و نەخش و نیگاری ناوازە و ڕەنگین ئارایشت دراون.

بەم جۆرە، بینیتان کە چۆن ئەم سێ ئایەتە، لە گۆشەی دانستی خواوەندەوە، گرنگییەکی مەزنیان تێدایە.

* * *

ئێستاش سەرنج لە نەرمونیانیی ڕوونکردنەوەکانی قورئانی پیرۆز و ئیعجازی ڕەوانبێژییە بەرزەکەی بدەن، با بزانن کە چۆن لەم ڕێیەوە مرۆڤ بۆ سێ ڕووداوی تر بێدار دەکاتەوە،

تاکو بۆ کەسانی ژیر ببێت بە مایەی دەرس و پەند وەرگرتن و لە هەمان کاتیشدا -لەم رێیەوە- سەرزەنشتێکی سەختیان دەکات.

بۆ نموونە: هەروەك لە برگەی دووهەمدا، واتە: ﴿وإِنَّ منها لَمَا يشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنه المـاءَ﴾ ئاماژە بۆ ئەو بەردە دەکات کە لە ژێر لێدانی عەساکەی حەزرەتی مووسادا - درودی لەسەر بێت - بەوپەڕی شەوق و تاسەمەندییەوە لەت بووە و دوازدە کانیی ئاوی لێ هەڵقوڵاوە، لە هەمان کاتیشدا ئەم واتایەی خوارەوە بە زەینی مرۆڤدا دەهێنێت و دەفەرموێ:

ئەی نەوەی ئیسرائیل! بەردە مەزنەکان لەبەر تەنها یەك دانە موعجیزەی حەزرەتی مووسا - درودی لەسەر بێت - ورد و خاش و نەرم دەبن لە سام و شکۆی ئەو موعجیزەیەدا.. یان لە خۆشحاڵیدا بۆ ئەو موعجیزەیە وەك لافاو فرمێسك هەڵدەرێژن! ئەدی بۆچی ئێوە بەرامبەر بەو هەموو موعجیزاتەی حەزرەتی مووسا پشت هەڵدەکەن و چاوتان فرمێسك هەڵناڕێژێت؟ بەڵکو چاوەکانتان فرمێسکی تێدا دەبەستێت و دڵانیشتان لە بەرامبەر ئەو موعجیزاتانەوە بە ڕەق و تەقی دەمێننەوە و نەرم نابن؟!

بە برگەی سێهەمیش، واتە: ﴿وَإِنَّ منها لَمَا يَهْبِطُ مِن خشيةِ اللهِ﴾ ئەو ڕووداوە مەزنە دێنێتەوە یاد کە لە دەمی موناجاتی حەزرەتی مووسادا - درودی لە سەر بێت - لە "تووری سینا" ڕووی دا، کە بریتییە لەو درەوشانەوە خواییەی هەرەمەزنەی کە لە چیاکە دەرکەوت و، وردوخاشی کرد و لە سام و شکۆی خواوەندا بە هەموو لایەکدا بڵاوی کردەوە. جا هەروەك ئەم برگەیە ئەو ڕووداوە دەهێنێتەوە یاد، لە هەمان کاتدا ڕێنماییش بە واتایەکی وەك ئەمەی خوارەوە دەکات:

ئەی قەومەکەی مووسا! بۆچی لە خوا ناترسن و ئاوڕ لە سام و شکۆی ئەو نادەنەوە؟ ئەوەتا چیا گەردن کەشەکان، کە لە بەردی ڕەق پێکهاتوون، لە تاو مەترسی و سام و شکۆی ئەودا هەپروون هەپروون دەبن و بەم لا و ئەولادا بڵاو دەبنەوە. ئنجا لەو کاتەدا کە دەبینن خواوەند پەیمانی لێ وەرگرتن کە "چیای توور"تان بەسەردا بەرز بکاتەوە، هاودەم لەگەڵ ئاگاداری و چاوکەوتنتان بە لەت بوونی ئەو چیایە لە ڕووداوە مەزنەکەی داواکاریی بینینی خوای گەورەدا. ئیتر چۆن پرکێشی دەکەن و لە ترسی خوای گەورە لەرزتان لێ نایەت و دڵتان ئاوا ڕەق و ئەستوور دەردەچێت؟

هەروەها لە برگەی یەکەمیشدا واتە: ﴿وإِنَّ مِنَ الْحِجارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْـــهارُ﴾ چەند ڕووبارێکی وەك نیل و دیجلە و فوراتیان بە ئاماژە بۆکردن یاد دەخاتەوە کە لە ناو چیاکانەوە هەڵدەقوڵێن و، لە هەمان کاتیشدا مرۆڤ تێدەگەیەنێت کە ئەو بەردانە تا چەند گوێڕایەڵیی ئیعجازبەخش و ملکەچ بوونی دەراسایان بەرامبەر فەرمانە تەکوینییەکە

بەدەست هێناوە و تا چەندەش ڕام و ژێربار و فەرمانبەرداری ئەو فەرمانانەن. جا ئەم بڕگەیە، بەم فێرکردنە، ئەم واتایەی خوارەوە بە دڵانی بێدار دەبەخشێت:

هەرگیز ناگونجێ ئەم چیا سەخت و زەبەلاحانە سەرچاوەی ڕاستەقینەی ئەم چەشنە ڕووبارە مەزنانە بن. چونکە ئەگەر بارستایی تەواوی ئەم چیایانە پڕ بن لە ئاو، واتە گەر چیاکان حەوزی قووچەکیی ئەو ڕووبارانە بن، ئەوا هەر بەشی لەبەرڕۆیشتنی تەنها چەند مانگێکی ئەو ڕووبارانە دەکەن، کە بە خوڕی و بەردەوامی ئاویان لەبەر دەڕوات. جگە لەوەش ئەو بارانانەی کە لە یەك مەتر زیاتر لە ناخی زەویدا ڕۆناچن، هەرگیز نابن بە دەرامەتێکی سەروزیادی ئەو لەبەر ڕۆیشتنە بەردەوام و زۆرەی ڕووبارەکان!

بەو واتایەی کە هەڵقوڵانی ئەو ڕووبارانە کارێکی "ئاسایی و سروشتی" یان "ڕێکەوت و هەڕەمەکی" نییە، بەڵکو بەدیهێنەری مەزن تەنها لە گەنجینەی غەیبەوە بە لافاو هەڵیان دەقوڵێنێت و بە چەشنێکی دەراسا و بەخوڕ دەیانخاتە ڕێ.

ئاماژەی ڕیوایەتی فەرموودەیەکی پیرۆز ئەم واتایە دەگەیەنێت کە: هەریەك لەو سێ ڕووبارە، لە بەهەشتەوە بە هەمیشەیی چەند دڵۆپێکیان بەسەردا دەچۆڕێت، بۆیە بەپیت و بەرەکەتن. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە سەرچاوەی ئەم سێ ڕووبارە لە بەهەشتدایە[1]. حەقیقەتی ئەو ڕیوایەتە بریتییە لەوەی کە:

هۆکارە ماددییەکان بەشی ئەوە ناکەن کە بتوانن ئەم ڕووبارانە بتەقێننەوە و ئاوا بە زۆری ئاویان لێ هەڵبقوڵێنن. کەواتە دەبێ سەرچاوەکانیان لە جیهانی غەیبدا بێت و لە گەنجینەی میهرەبانییەکی غەیبییەوە هەڵبقوڵێن، بۆیە دەرامەت و لەبەر ڕۆیشتنیان هەمیشە هاوسەنگ و بەردەوامە.

بەم جۆرە، قورئانی پیرۆز دەرسێکی ڕەوان دەڵێتەوە و، بۆ ئەم واتایەی خوارەوەش بێداریان دەکاتەوە:

ئەی نەوەی ئیسرائیل و ئەی نەوەی ئادەم! ئێوە بە دڵڕەقیتان سەرپێچی لە فەرمانەکانی پەروەردگارێکی مەزن دەکەن و، بەهۆی بێئاگاییشتان لەو پەروەردگارە، چاوەکانتان لە ئاستی ناسینی ئەو نوورە نەخش و نیگارکێشەدا دەنووقێنن کە زەویی وشك و برنگی میسری گۆڕی بە بەهەشتێکی فراوان و، ڕووباری مەزن و موبارەکی نیل و ڕووبارەکانی تری هاوچەشنی ئەویشی لە دەمی چەند بەردێکی ڕەقی ئاسایییەوە هەڵقوڵاندووە و، بەمەش

(١) عن أبـي هريرة رضى الله عنه: قال: قال رسول الله ﷺ : "سَيْحان وجَيْحان والفرات والنيل كلٌّ من أنهار الجنة" رواه مسلم كتاب الجنة: ٢٦ وأورد الخطيب البغدادي: "ليس من الجنة في الأرض شئ إلاّ ثلاثة أشياء: غرس العجوة والحجر وأوراق تنزل في الفرات كل يوم بركة من الجنة". هەروەها بڕوانە: فيض القدير: ٣٨١/٥. (وەرگێڕ)

موعجیزاتی توانست و، شایەتی بەهێزی بە قەدەر توانا و هێزی ئەو ڕووبارە مەزنانە و. بەڵگەی ڕووناكی بە ئەندازەی ڕێژنەی ئەو ڕووبارانە، لەسەر "یەكتایی" خۆی دەرخستووە. ئیتر خواوەند ئەو بەڵگە و شایەتی‌یانە لەناو دڵی بەرنەوەراندا دادەنێت و، بە مێشكی گۆی زەوی‌یان دەسپێرێت و، بە وێنەی لافاو لە دڵ و ژێریی گرۆی جینی و ئادەمیزاددا ڕۆیی دەكات! پاشان خواوەند وا لەو بەردە ڕەق و بێ‌هەست و نەستانە[1] دەكات كە موعجیز تی توانستی ئەو بنوێنن، بە ڕادەیەك كە ئەو بەردانە بە وێنەی ئەوەی كە ڕووناكیی خۆر دەبێت بە بەڵگە لەسەر "خۆر"، ئەوانیش ئاوا دەبن بە بەڵگە لەسەر بەدیهێنەری مەزنیان. ئەدی ئێوە: چۆن ئەو بەڵگانە نابینن و لە ئاستی بینینی نووری ئەودا چاوەكانتان كوێر و نابینا بووە؟

* * *

بڕوانە چۆن ئەم سێ ڕاستی‌یە پۆشاكی جوان و ڕەنگینی ڕەوانبێژی‌یان پۆشیوە و، بە وردی سەرنج لە بەلاغەتی ڕێنمایی ئەم ئایەتانە بدە، با ڕادەی ڕەقی و ئەستووریی ئەو دڵانەت بۆ دەربكەوێت كە بە سام و هەیبەتەوە لە بەردەم ئەو ڕێنمایی‌یە ڕەوانەدا وردوخاش نابن!

جا ئەگەر هەر لە سەرەتاوە تا كۆتایی لەم وتەیە تێ گەیشتبیت، ئەوا فەرموو بریسكانەوەی ئیعجاز ببینە لە شێوازی ڕێنمایی قورئاندا و، ئنجا سوپاسی پەروەردگاری مەزنی خۆتی لەسەر بكە.

﴿سبحانكَ لا عِلمَ لنا إلاّ ما علَّمْتَنا إنَّكَ أنتَ العليم الحكيم﴾.

اللهم فهمنا أسرار القرآن كما تحب وترضى ووفقنا لخدمته.. آمين برحمتك يا أرحم الراحمين.

اللهم صلِّ وسلِّم على مَنْ أُنزلَ عليه القرآن الحكيم وعلى آله وصحبه أجمعين.

---

(١) ڕووباری "نیل" لە "جبل القمر"ەوە هەڵدەقوڵێت و، گرنگترین جۆگەی پێكهێنەری ڕووباری "دیجلە"ش لە ئەشكەوتی بەردێكەوە هەڵدەقوڵێت كە دەكەوێتە ناوچەی "موكس"ی سەر بە پارێزگای "وان" و، گەورەترین جۆگەی پێكهێنەری ڕووباری "فورات"یش لە ژێر چیایەكەوە هەڵدەقوڵێت كە دەكەوێتە بەری "دیادین". جا لەبەر ئەوەی بە ڕاستی چیاكان لە بنەڕەتدا لە ماددەیەكی شل پێكهاتوون، پاشان ئەو ماددەیە بەستوویەتی و بەردیان لێ دروست بووە، وەك لە زانستە نوێ‌یەكاندا چەسپاوە و ئەو زیكرە نەبەوی‌یەش دەبێ بە بەڵگە لەسەری كە دەفەرموێ: "سبحانَ مَنْ بَسَطَ الأرضَ على ماءٍ جمد" ئەوا ئەمانە دەبن بە بەڵگەی بێ گومان لەسەر ئەوەی كە بنەڕەتی دروستبوونی زەوی بەم جۆرەی خوارەوە بووە:

ماددەیەكی هاوچەشنی ئاو، بە فەرمانی خواوەند بەستوویەتی و بووە بە بەرد. ئنجا ئەو بەردەش بە فەرمانی خوای گەورە بووە بە گڵ. چونكە وشەی "الأرض" كە لە زیكرەكەدا هاتووە، مەبەست پێی گڵە. بەو واتایەی كە ئەو ئاوە (واتە ئەو ماددە شلەمەنی‌یە) لە پێشدا نەرم و شل بووە و نەگونجاوە هیچ شتێكی لەسەر ڕاگیر بكرێت پاشان بەردیش لە خۆیدا ڕەق و تەقە و چ سوودێكی لێ وەرناگیرێت. بۆیە خواوەندی دانای میهرەبان گڵی بەسەر بەرددا ڕاخست تاكو ببێت بە نیشتەجێی زیندەوەران. (دانەر).

## مەقامی دووهەمی

### وتەی بیستەم

### بریسکانەوەی ئیعجازێکی قورئان کە بەسەر ڕووی موعجیزاتی پێغەمبەرانەوە دەدرەوشێتەوە

### بە وردی سەیری دوو وەڵامەکەی پرسیارەکانی کۆتایی بکە

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿ولا رَطْبٍ ولا يابِسٍ إلاّ في كتابٍ مبين﴾ (الأنعام:٥٩)

بیست و چوار ساڵ پێش ئێستا[1] لە تەفسیرە عەرەبی‌یەکەمدا کە ناوی "إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز"ە، باسێکم نووسی کە تایبەت بوو بە یەکێك لە نهێنی‌یەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە. وا ئێستاش لەسەر داخوازیی دوو برای بەڕێز و ئازیز، بە زمانی تورکی ڕوونکردنەوەیەك بۆ ئەو باسە دەنووسم و، پشت بە تەوفیق و یارمەتیی خوای گەورە دەبەستم و ئیلهام لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆز وەردەگرم و، دەڵێم:

"کتاب مبین" بەپێی بۆچوونێك، بریتی‌یە لە قورئانی پیرۆز. کەواتە ئەم ئایەتە پیرۆزە - بەپێی ئەو بۆچوونە - دەری دەخات کە: هیچ تەڕ و وشکێك نی‌یە کە لە قورئاندا باسی نەهاتبێت.

- ئایا وایە؟

- بەڵێ وایە، هەموو شتێك لە قورئاندا هەیە.. بەڵام هەموو کەسێك ناتوانێت هەموو شتێکی تێدا دەربهێنێت. چونکە وێنە و شێوەی شتان لە قورئانی پیرۆزدا جیاجیا و جۆراوجۆر دەردەکەون. ئەوەتا هەندێ جار "ناوك" یان "تۆو"ی ئەو شتە و، هەندێ جار کورتە و پوختەکەی و، هەندێ جاری تر دەستوورەکانی و، هەندێ جاری دیکەش چەند نیشانەیەکی ئەو شتەی تێدا دانراوە. ئنجا هەموو ئەم پلانەش یان بە ڕاشکاوی یان بە ئاماژە

---

(١) مەبەست یەکەم ساڵی جەنگی جیهانیی یەکەمە. (وەرگێڕ)

یاخود هێما یاخود بە چەشنێكی تەماوی و نادیار یان لە شێوەی بێدار كردنەوەدا باس دەكرێن. چونكە قورئانی پیرۆز لە ناوەندی شێوازەكانی ڕەوانبێژییەكەیدا و بەپێی پێویست و بە گوێرەی داخوازیی موناسەبەی حاڵ و مەقام، مەبەستەكانی دەردەبڕێت.

بۆ نموونە: فڕۆكە و كارەبا و شەمەندەفەر و جیهازی بێ تەل و تازە داهاتووەكانی تری زانست و تەكنۆلۆژیای نوێ كە بە بەرهەمی بەرەو پێشچوون و بەرزبوونەوەی مرۆڤ دادەنرێن لە بواری پیشەسازی و زانستدا، بوون بە مایەی بایەخ پێدانی مرۆڤی سەردەم و جێگە و پایەیەكی تایبەتییان لە ژیانی ماددیی ئەودا بەدەست هێناوە. بۆیە ئەو قورئانە پیرۆزەی كە ڕووی گوفتار لە سەرجەمی چینەكانی مرۆڤایەتی دەكات، ئەم لایەنەی ژیانی مرۆڤیشی پشت گوێ نەخستووە، بەڵكو لە دوو ڕووەوە ئاماژەی بۆ كردووە:

**ڕووی یەكەم:** لە كاتی ئاماژەكردنیدا بۆ موعجیزاتی پێغەمبەران - درودیان لەسەر بێت - ئاماژەی بۆ ئەوانەش كردووە.

**ڕووی دووهەم:** لە كاتی گێڕانەوەی هەندێ ڕووداوی مێژووییدا ئاماژەی بۆ كردوون.

بۆ نموونە: ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوە ئاماژەیان بۆ شەمەندەفەر كردووە:

**﴿قُتِلَ أَصحابُ الأُخْدودِ ۞ النَّارِ ذاتِ الوَقودِ ۞ إذْ هُمْ عَلَيها قُعود ۞ وَهُمْ علـى مـا يَفْعَلُونَ بالْمُؤْمِنينَ شُهود ۞ وما نَقَمُوا مِنْهُمْ إلاّ أنْ يُؤْمِنوا باللهِ العَزيزِ الحميدِ﴾**(البروج:٤-٨)[1].

هەروەها:

**﴿في الفُلْكِ المشحونِ ۞ وخَلَقْنا لَهُم مِنْ مِثْلِهِ ما يَرْكَبونَ﴾** (يس:٤١-٤٢).

ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوەش سەرباری ئەوەی كە ئاماژەی بۆ گەلێ نوور و نهێنی كردووە، هێماشی تێدایە بۆ كارەبا:

**﴿اللهُ نورُ السَّمواتِ والأَرضِ مَثَلُ نورِهِ كَمِشْكـوةٍ فيها مِصْبـاحٌ المِصْبـاحُ في زُجاجـةٍ الزُّجاجةُ كأنّها كَوْكَبٌ دُرّيٌّ يوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لا شَرْقِيَّةٍ ولا غَرْبيَّةٍ يَكادُ زَيْتُـها يُضيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نارٌ نورٌ علـى نورٍ يَهدِي اللهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشاءُ﴾**[2](النور:٣٥).

جا لەبەر ئەوەی گەلێ كەس لە بەڕێزان بۆ ئەم بەشە لێبڕاون و هەوڵی زۆریان بۆ ڕوونكرنەوەی داوە (هەرچەندەش گرتنە ئەستۆی ئەم كارە داخوازی ئەوپەڕی وردەكاری

---

(١) ئەم ڕستەیە ئاماژە دەكات بۆ ئەوەی كە ئەو شتەی جیهانی ئیسلامیی بە كۆت و زنجیری خۆی بەستەوە و دیلی كردن، بریتییە لە شەمەندەفەر كە بە هۆیەوە كافران بەسەر موسڵماناندا سەركەوتن. (دانەر)*

* مەبەستی دانەر ئەو كارەساتەیە كە لە جەنگی یەكەمی جیهانیدا كافران بەسەر موسڵمانانیاندا هێنا. (وەرگێڕ)

(٢) ڕستەی: ﴿يَكادُ زَيْتُها يُضيءُ و لَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نارٌ﴾ ئەو هێمایە ڕوون دەكاتەوە. (دانەر)

دەبێت و پێویست دەكات بە شێوەیەكی فراوانتر ئەو باسانە پێش‌چاو بخرێن و ڕوون بكرێنەوە) و سەرەڕای ئەوەش كە گەلێ نموونەی زۆریش هەن لەسەری.. لەبەر ئەوە، لێرەدا ئەو دەرگایە ناخەینە سەرپشت و بە خستنە ڕووی ئەو ئایەتە ناوبراوانە واز دەهێنین.

بەڵام سەبارەت بە بەشی یەكەمەوە، كە لە ناوەندی ئاماژە كردنی قورئاندا بۆ موعجیزاتی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - ئاماژەی بۆ ئەو داهێنانە نوێیانەش كردووە كە وەك شتی لەعادەت‌بەدەر وان.. وا چەند نموونەیەكیان لێ باس دەكەین:

**پێشەكی**: قورئانی پیرۆز دەری دەخات كە پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - بۆ ناو كۆمەڵانی مرۆڤ ڕەوانە كراون، تاكو لە بەرزبوونەوە و "پێشكەوتنی مەعنەوی"دا ببن بە پێشەوا و چاولێكراویان. لە هەمان كاتیشدا ڕوونی دەكاتەوە كە خوای گەورە موعجیزەیەكی ماددیی داوەتە دەست هەموو یەكێك لەو پێغەمبەرانە و لە "پێشكەوتنی ماددی"شدا كردوونی بە مامۆستا و پێشڕەوی گرۆی مرۆڤ. واتە قورئان فەرمان دەدات كە بە تەواوەتی و لە سەرجەم كاروباره ماددی و مەعنەوی‌یەكاندا شوێن پێی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - هەڵبگرن و چاویان لێ بكەن..

چونكە هەروەك قورئانی پیرۆز لە دەمی باسكردنی كەماڵاتی مەعنەویی پێغەمبەراندا - درووودیان لەسەر بێت - هانی مرۆڤ دەدات كە پتر لە ڕووناكیی خووڕەوشتە جوانەكانی پێغەمبەران بەهرەمەند ببێت، هەر ئەو قورئانە لە دەمی باسكردنی موعجیزە ماددی‌یەكانیشیاندا دەیەوێت شەوقی گرۆی مرۆڤ ببزوێنێت تاكو لاسایی ئەو موعجیزانەی ناو دەستی پێغەمبەران بكەنەوە و، بە ئاماژە، هانیان دەدات كە لە پێشكەوتنی ماددیشدا بگەنە ئاستی هاووێنەی ئەو موعجیزاتانە. بگرە دەتوانرێت بوترێ: تەنها دەستی موعجیزەی پێغەمبەران بوو كە بۆ یەكەم جار كەماڵ و كاری دەراسای ماددیی پێشكەش بە گرۆی مرۆڤ كرد، وەك ئەوەی كەماڵی مەعنەویی پێشكەش كردن!

ئەگەر نموونەت لەسەر ئەمە دەوێت ئەوا بڕوانە بۆ كەشتی‌یەكەی حەزرەتی نووح - درووودی لەسەر بێت - كە یەكێكە لە موعجیزاتی ئەو پێغەمبەرە و، كاتژمێرەكەی حەزرەتی یووسفیش - درووودی لەسەر بێت - كە یەكێكە لە موعجیزاتی حەزرەتی یووسف. ئەوەبوو بۆ یەكەم جار دەستی موعجیزەی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - بە وێنەی دیاری‌یەكی بەنرخ پێشكەشی ئادەمیزادی كردن.

ئەم ڕاستی‌یەش ئاماژەیەكی نەرمونیانی لەسەر هەیە، كە بریتی‌یە لەوەی زۆربەی پیشەسازان یەكێك لە پێغەمبەرانیان كردووە بە جەمسەر و پێشڕەوی سنعەت و پیشەكەیان. بۆ نموونە: كەشتیوانەكان حەزرەتی نووحیان - درووردی لەسەر بێت - كردووە بە

پێشرەویان و، سەعاتچی‌یەکانیش حەزرەتی یووسفیان - درووودی لەسەر بێت - کردووە بە پێشەوایان و، بەرگدرووەکانیش حەزرەتی ئیدریسیان - درووودی لەسەر بێت - کردووە بە ڕابەریان.

جا لەبەر ئەوەی سەرجەم زانا لێکۆڵەرەکانی ڕەوانبێژی لەوەدا یەکیان گرتووە کە هەموو ئایەتێکی قورئانی پیرۆز چەند ڕوویەکی جیاجیای ڕێنمایی و چەندەها لایەنی زۆری هیدایەتی تێدایە، ئەوا هەرگیز ناگونجێ کە ڕووناکترین و درەخشانترین ئایەتەکانی قورئان - کە ئایاتی موعجیزاتن - تەنها بریتی بن لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی مێژوویی، بەڵکو دەبێ - جگە لەمەش - گەلێ واتای ڕەوانی ڕێنمایی و هیدایەتیشیان لەخۆ گرتبێت.

بەڵێ، کاتێ کە قورئانی پیرۆز موعجیزاتی پێغەمبەران دەهێنێت، بەم کارەی: هێڵی دو سنووری ئەوپەڕی توانای مرۆڤ دەکێشێت لە بوارەکانی زانست و پیشەسازیدا و. ئاماژەیان پێ دەکات بۆ کۆتایی ئەو ئامانجانەی کە مرۆڤ دەتوانێت بیانهێنێتەدی. کەواتە قورئان بەم باسکردنەی موعجیزاتی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - سنووری دوورترینی دوا ئەنجام لەو بوارانەدا بۆ مرۆڤ دەکێشێت و، پاشان هانی گرۆی ئادەمیزاد دەدات و دەیانداتەبەر تاکو بگەن بەو سنوور و ئەنجامانە. چونکە هەروەك کاتەکانی ڕابوردوو عەمبار و گەنجینەی تۆوەکانی داهاتووە و ئاوێنەیەکە کاروبارەکانی داهاتوویان تێدا دەردەکەوێت، داهاتووش داهاتی تۆوەکانی ڕابوردووە و ئاوێنەی ئاواتەکانیەتی.

وا بۆ نموونە لەو سەرچاوە بەپیت و فراوانە، چەند نموونەیەك ڕوون دەکەینەوە:

○ بۆ نموونە: ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ﴾ (سبأ:١٢).

ئەم ئایەتە پیرۆزە یەکێك لە موعجیزاتی حەزرەتی سولەیمان - درووودی لەسەر بێت - ڕوون دەکاتەوە. کە بریتی‌یە لەوەی "با"ی بۆ ژێربار و گوێڕایەڵ کرابوو. واتە ئەمسەر و ئەوسەری ئەو ماوەیەی کە بە دوو مانگ دەبڕرا، ئەم لە هەوادا بە یەك ڕۆژ دەیبڕی!

ئەم ئایەتە، ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی: ڕێگا لە بەردەم مرۆڤدا کراوەتەوە کە ئەم چەشنە ماوەیە لە هەوادا ببڕێت.

کەواتە ئەی گرۆی مرۆڤ! هەوڵ بدە بگەیتە ئەم پلەیە، مادەم ڕێگات لە بەردەمدا کراوەتەوە. تێبکۆشە لەم پلە و پایەیە نزیك ببیتەوە.

وەك بڵێی خوای گەورە لە واتای ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

(یەکێك لە بەندەکانم وازی لە "هەوا"ی دەروونی خۆی هێنا و، منیش سواری پشتی "هەوا"م کرد! خۆ ئەگەر تۆش - ئەی مرۆڤ! - واز لە تەمبەڵیی دەروونت بهێنیت و بە باشی

سوود لەو یاسایانەی سوننەتی من وەربگریت کە لە گەردووندا کار دەکەن، ئەوا تۆش دەتوانیت سواری پشتی "هەوا" ببیت)!

○ نموونەیەکی تر:

﴿فَقُلْنا اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْحَجَرَ فانْفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتا عَشْرَةَ عَيْناً...﴾ (البقرة:٦٠).

ئەم ئایەتە پیرۆزە یەکێك لە موعجیزاتی حەزرەتی مووسا - دروودی لەسەر بێت - ڕوون دەکاتەوە و، لە هەمان کاتیشدا ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە: دەتوانرێت بە چەند ئامێر و ئامرازێکی سادە، سوود لە گەنجینەکانی میهرەبانیی شارراوەی ژێر زەوی وەربگیرێت، تەنانەت ئاوی سەرچاوەی ژیانیش لە زەوییەکی ڕەقی مردووی وەك بەرد، بە هۆی عەسایەکەوە، هەڵبقولێنرێت.

جا ئەم ئایەتە بەم واتایەی خوارەوە لەگەڵ گرۆی مرۆڤدا دەدوێت:

دەتوانن بەهۆی عەسایەکەوە ئەو ئاوە بەدەست بهێنن کە ناسکترینی ڕێژنەکانی میهرەبانیی خواوەندە. دەسا تێبکۆشن و بە گەرمی هەوڵ بدەن تاکو بیدۆزنەوە.

کەواتە خوای گەورە بەم واتا ڕەمزییەی خوارەوە لەگەڵ مرۆڤدا دەدوێت:

(مادەم عەسایەکم بە دەستی بەندەیەکی خۆم سپاردووە کە پشتم پێ دەبەستێ و باوەڕی پێمە و، لە هەر شوێنێکدا بیەوێت دەتوانێت بەو عەسایە ئاو هەڵبقولێنێت، ئەوا تۆی مرۆڤیش گەر پشت بە یاساکانی میهرەبانیم ببەستیت، دەتوانیت بە هەمان جۆر ئامێرێکی هاووێنەی ئەو عەسایە دابهێنیت. دەسا هەوڵ بدە با ئەو ئامێرەت دەست بکەوێت).

دەبینیت کە چۆن ئەم ئایەتە یەکەم پێشڕەو بووە بۆ پەیدا کردنی ئامێرێك کە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆیەوە لە زۆربەی شوێندا ئاوی لە زەوی پێدەربهێنێت. ئەو ئامێرەی کە یەکێکە لە هۆکارەکانی بەرەوپێش چوونی ژیانی مرۆڤایەتی. تەنانەت ئەم ئایەتە پیرۆزە هێڵی دوا سنوور و ئەوپەڕی توانای بەکارهێنانی ئەو ئامێرەی دەستنیشان کردووە، بە وێنەی ئایەتی پێشوو کە دوا خاڵەکانی کۆتایی و ئەوپەڕی توانای فڕۆکەی نوێی دەستنیشان کرد.

○ نموونەیەکی تر: ﴿وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتى بِإِذْنِ اللهِ﴾ (آل عمران:٤٩).

قورئانی پیرۆز هەروەك بە "ڕاشکاوی" هانی مرۆڤایەتی دەدات کە شوێنی خووڕەوشتە پێغەمبەرییە بەرزەکانی حەزرەتی عیسا بکەون - دروودی لەسەر بێت - بە "هێما"ش بۆ ئەو خووڕەوشتانە هانیان دەدات کاتێ کە سەرنجیان بۆ لای ئەو پیشە پیرۆز و پزیشکییە پەروەردگارییە مەزنەی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - ڕادەکێشێت.

وەك بلێی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە:

دەگونجێ دەرمانێك بدۆزرێتەوە کە سەختترین نەخۆشی و دەردی پێ چارەسەر بکات. کەواتە ئەی مرۆڤ! بێ هیوا مەبە.. ئەی گرفتار و گیرۆدەی نەخۆشی! نائومێد مەبە.. چونکە هەموو دەردێك دەرمانی هەیە و دەگونجێ چارەسەر بکرێت. دەسا بە شوێنیدا بگەڕێ و بیدۆزەرەوە. تەنانەت دەگونجێت لە ڕێی جۆرە ژیانێکی کاتییەوە چارەسەریی خودی مردنیش بکرێت.

خوای گەورە لە ڕێی "واتای ئاماژەیی"ی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە دەفەرموێت:

(یەکێك لە بەندەکانم لە پێناوی مندا دەستی لە دنیا هەڵگرت، منیش دوو دیاریم پێ بەخشی. یەکێکیان: دەرمانی دەردە مەعنەوییەکان و، ئەوی تریشیان: چارەسەریی نەخۆشییە ماددییەکانە. ئەوەتا دڵە مردووەکان بە نووری هیدایەتی ئەو زیندوو دەبنەوە و. ئەو نەخۆشانەش کە لە حوکمی مردواندان تەنها بە فوویەکی ئەو چاك دەبنەوە. تۆی مرۆڤیش دەتوانیت لەناو دەرمانخانەی حیکمەتی مندا دەرمانی هەموو دەردەکانت بدۆزیتەوە. دەسا لەم پێناوەدا تێبکۆشە و ئەو دەرمانە بدۆزەرەوە کە بێ هیچ گومانێك بە دەستی دەخەیت و دەیدۆزیتەوە).

بەم جۆرە دەبینیت کە چۆن ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوپەڕی ئامانجە دوورەکانی ئەو پێشکەوتنەی دەستنیشان کرد کە زانستی پزیشکیی مرۆڤ ئاواتەخوازە پێی بگات.

کەواتە ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ ئەو ئامانجە دەکات و هانی مرۆڤ دەدات بەدەستی بهێنێت.

❍ نموونەیەکی تر: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ الحَدِيدَ﴾ (سبأ: ١٠).

﴿وآتيناهُ الحِكمةَ وَ فَصْلَ الخِطاب﴾ (ص: ٢٠).

ئەم دوو ئایەتە تایبەتن بە موعجیزەی حەزرەتی داوود - دروودی لەسەر بێت - و، ئایەتی: ﴿وأَسَلْنا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ﴾یش (سبأ: ١٢) تایبەتە بە موعجیزەی حەزرەتی سولەیمانەوە، دروودی لەسەر بێت.

ئەم ئایەتانە ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی کە:

نەرمکردنی ئاسن نیعمەتێکی بەرزی خواوەندە، چونکە خوای گەورە لەم ڕێیەوە فەزڵ و گەورەیی پێغەمبەرێکی مەزن دەردەخات. ئەوەتا نەرمکردنی ئاسن بە چەشنی هەویر و، توانەوەی مس و، دۆزینەوە و پەیدا کردنی کانزاکان، سەرەتا و بناغەی سەرجەم پیشەسازییەکانی مرۆڤن و، لەم ڕووەوە کانگا و سەرچاوەی پێشکەوتنی شارستانێتین.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بۆ نیعمەتی گەورەی خواوەند دەکات لە: نەرمکردنی هەویرئاسای "ئاسن" و "مس"دا و گۆڕینیان بە چەند تەلێکی باریك، کە دوو تەوەرەن بۆ

زۆربەی پیشەسازی‌یە گەورەکان. چونکە خـوای گـەورە لـە شێوەی موعجیزەیەکی مـەزنی پێغەمبەرێکی گەورە و جێ‌نشینێکی مەزنی زەوی‌دا بەخشیونی و باسـی کـردوون. جـا مـادەم خواوەند بەم ئایەتە ڕێزی لـە کەسێك ناوە کە لە یـەك کـاتدا پێغەمبـەر و جێ‌نشینە و، نیعمـەتی دانایی و چارەسەرکردنی کێشەکانی بە زمانی ئەو بەخشیوە و، ئەم سنعەتە پێشکەوتووەشی بە دەستی ئەو سپاردووە و، بە ڕاشکاویش هانی مرۆڤایەتیی داوە، چاو لەو نیعمەتە بکـەن کـە بـە زمانی ئەو پێغەمبەرە بەخشراوە. دەبێ قورئان ئاماژەیەکی ئەوتۆشی تێدا بێت کە هانیان بدات چاو لەو سنعەت و کارامەیی‌یەی ناو دەستیشی بکەن!

واتە: خوای گەورە لە ڕێی "واتای ئاماژەیی"ی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە دەفەرموێت:

(ئـەی نـەوەی ئـادەم! یـەکێك لـە بـەندەکانم کـە ملـی بـۆ داخوازی‌یـەکانم کــەچ کــرد و، گوێڕایـەڵیی فەرمانـەکانم بـوو، توانـای گفتوگۆیـەکی وام بـە زمـانی بەخشـی کــە بتوانێــت چارەسەریی کێشەکانی پێ بکات و، دڵەکەشیم بـە دانستێك پـڕ کـرد کـە هـەموو شتێك بـە ڕوونی لە یەکتر جیا بکاتەوە و.. ڕاستی‌یەکی هێندە ڕەنگینیشم لەناو دەستی‌دا دانا کـە ئاسـن لە دەستی‌دا وەکو مۆمی لـێ دەهات و بە هەر شێوەیەك بیویستایە شێوە و شکڵی ئـەو ئاسـنەی دەگۆڕی و، هـێزێکی مـەزنی بـۆ جێگـیر کردنـی پایـەی خەلافەتەکـەی و بـەردەوامبوونی فەرمانڕەوایـەتیی دەوڵەتەکـەی لـێ وەردەگـرت. جـا مـادەم ئـەم کـارە لـە توانـادا هەیـە و لــە واقیعیشدا ڕووی داوە و بـۆ ژیـانی کۆمەڵایەتیشـتان گرنگی‌یـەکی لەڕادەبـەدەری هەیـە، ئـەوا ئێـوەش – ئـەی نـەوەی ئـادەم! – ئەگـەر گوێڕایـەڵیی فەرمانـە تەکوینی‌یـەکانم بـبن، ئـەوا ئـەو دانست و سنعەتەتان دەدرێتێ و دەتوانن بە درێژایی ڕۆژگار لێیان نزیك ببنەوە و پێیان بگەن)!

ئـەوەتا گەیشـتنی مـرۆڤ بەوپـەڕی ئاواتـەکانی لـە بـواری پیشەسـازی‌دا و بەدەسـتهێنانی توانسـتێکی لەڕادەبـەدەر لـە لایـەنی هـێزی ماددی‌یـەوە، تەنــها بـەهۆی نـەرمکردنی ئاسـن و توانەوەی مسەوە بوو. جا ئەم ئایەتە پیرۆزانەش سەرنجی مرۆڤایەتی – بـە گشـتی – بـۆ لای ئـەم ڕاستی‌یە ڕادەکێشن و، ئاوڕی پێشینان و تەمبەڵانی ئێستاشـی بـۆ لا دەدەنـەوە و، لـەم ڕێیـەوە ئەوانە بێدار دەکەنەوە کە تا ئێستا بایەخی شایستەیان بەم ڕاستی‌یە نەداوە.

❍ نموونەیەکی تر: ﴿**قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرّاً عِنْدَهُ...**﴾ (النمل: ٤٠).

ئەم ئایەتە، ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە: هێنان و ئامادەکردنی شتان، چ خـودی خۆیـان چ شکڵ و شێوەیان، لـە چەندان ماوەی دوورەوە، کارێکە لە توانـادا هەیـە. ئەمـەش لـەو ڕووەوە

كه بوو به به‌ڵگه له‌سه‌ر ئه‌و ڕووداوه ده‌راسایه‌ی له كۆڕی حه‌زره‌تی سوله‌یماندا – دروودی له‌سه‌ر بێت – ڕووی دا، كاتێ یه‌كێك له وه‌زیره‌كانی، كه زانیاری‌یه‌كی زۆری له "زانستی ئاماده كردن"دا پێ درابوو، به حه‌زره‌تی سوله‌یمانی وت: من عه‌رشی به‌ڵقیست بۆ ده‌هێنم!

خوای گه‌وره "پادشایی" و "پێغه‌مبه‌رێتی"ی پێكه‌وه به حه‌زره‌تی سوله‌یمان به‌خشیبوو. جگه له‌مانه‌ش بۆ مه‌به‌ستی ڕێزلێنانی ئه‌و، موعجیزه‌یه‌كی ئه‌وتۆی پێ دابوو كه ده‌یتوانی به‌هۆی ئه‌و موعجیزه‌یه‌وه ڕاسته‌وخۆ بێ هیچ قورسی و ئه‌ركێك چاوی له باروودۆخی ژیانی ڕه‌عیه‌ته‌كه‌یه‌وه بێت و سكالایان ببیستێت. هه‌ر ئه‌م موعجیزه‌یه‌ش بوو كه حه‌زره‌تی سوله‌یمانی ده‌پاراست له هه‌ر هه‌ڵه‌یه‌ك له كاروباری ڕه‌عیه‌تدا و، هۆكارێكی به‌هێزیش بوو بۆ بڵاو كردنه‌وه‌ی عه‌داله‌ت و هه‌ڵكردنی ئالای دادگه‌ری له هه‌موو جێگایه‌كی وڵاته‌كه‌یدا.

كه‌واته هه‌ر كه‌سێك پشت به خوای گه‌وره ببه‌ستێ و پاڵی پێوه بدات و، به زمانی توانا و لێهاتنه‌كانی سروشتی خۆی لێی بپارێته‌وه و، له ژیانیشیدا به‌پێی یاسا خوایی‌یه‌كان و چاودێریی په‌روه‌ردگار هه‌نگاو بنێت، ده‌گونجێ ئه‌م دنیا فراوانه‌ی له به‌رده‌مدا وه‌ك شارێكی ڕێكوپێك لێ بێت، وه‌ك ئه‌وه‌ی بۆ حه‌زره‌تی سوله‌یمان ڕووی دا كاتێ كه به زمانی پێغه‌مبه‌رایه‌تیی خاوێن و بێ گه‌رد داوای كرد: عه‌رشی به‌ڵقیسی بۆ ئاماده بكرێت و، ئنجا ئه‌و عه‌رشه‌ی – چ خۆی چ شێوه‌كه‌ی – له وڵاتی یه‌مه‌نه‌وه بۆ وڵاتی شام له به‌رده‌مدا ئاماده كرا. بێ گومان ده‌نگی پیاوانی ئاماده‌بووی ده‌وری ئه‌و عه‌رشه‌یش له كاتی هێنانیدا ببیستر' هه‌روه‌ك شێوه و ڕوخساریشیان ده‌بینرا!

ئه‌م ئایه‌ته ئاماژه‌یه‌كی ڕه‌نگین ده‌كات بۆ ئاماده كردنی ده‌نگ و ڕه‌نگه‌كان له چه‌نده‌ه' ماوه‌ی دووره‌وه. كه‌واته ئه‌م ئایه‌ته ده‌ده‌فه‌رموێ:

(ئه‌ی كاربه‌ده‌ستان! ئه‌ی ئه‌وانه‌ی كاروباری وڵاتتان له ئه‌ستۆ گرتووه! ئه‌گه‌ر ده‌تانه‌وێت "دادگه‌ری" هه‌موو لایه‌كی وڵاته‌كه‌تان بگرێته‌وه. ئه‌وا چاو له حه‌زره‌تی سوله‌یمان بكه‌ن و وه‌ك ئه‌و هه‌وڵ بده‌ن هه‌موو ئه‌و شتانه ببینن و بزانن كه له سه‌رانسه‌ری زه‌وی‌دا ڕوو ده‌ده‌ن. چونكه ئه‌و فه‌رمانڕه‌وا دادگه‌ره‌ی كه ده‌یه‌وێت ئالای دادگه‌ری له هه‌موو گۆشه‌یه‌كی وڵاته‌كه‌یدا بشه‌كێته‌وه و ئه‌و پادشایه‌ش كه به میهره‌بانی و به‌زه‌یی‌یه‌وه چاودێریی كاروباری هاووڵاتی‌یانی ده‌كات، ناگات به ئامانجه‌كانی ئه‌گه‌ر نه‌توانێت – هه‌ر كات بییه‌وێت – ئاگاداری هه‌موو هه‌رێم و لایه‌كی وڵاته‌كه‌ی بێت. خۆ ئه‌گه‌ر توانیی به‌و چه‌شنه ئاگادار بێت، ئه‌وا "دادگه‌ری" به ته‌واوه‌تی گشت لایه‌ك ده‌گرێته‌وه و، خۆیشی له موحاسه‌به و لێپرسینه‌وه‌ی مه‌عنه‌وی ڕزگار ده‌كات).

خوای گەورە بە (واتای هێما)ی ئەم ئایەتە پیرۆزە لەگەڵ مرۆڤدا دەدوێت و دەفەرموێ:

(ئەی نەوەی ئادەم! حوکمڕانیی وڵاتێکی یەکجار فراوانم دایە دەست یەکێك لە بەندەکانم و، ئاگاداربوونی ڕاستەوخۆشم پێبەخشی سەبارەت بە باروودۆخ و ڕووداوەکانی زەوی، تاکو بتوانێت بە تەواوەتی دادگەری جێبەجێ بکات. ئنجا مادەم توانا و لێهاتنێکی سروشتیم بە هەموو مرۆڤێك بەخشیوە بۆ ئەوەی ببێت بە جێنشین لە زەویدا، ئەوا بێ گومان بەپێی داخوازیی حیکمەتی خۆم ئەو بەهرە و توانا و لێهاتنەشەم داوەتێ کە بتوانێت بەهۆیانەوە سەیری هەموو گۆشە و لایەکی زەوی بکات و پەی بە ڕووداوەکانی ببات. خۆ هەرچەندە مرۆڤ بە "تاکە کەسی" ناتوانێت بگات بەم پلەیە، بەڵام دەتوانێ بە "جۆر" و هاوڕەگەزەکەی پێی بگات.. گەر نەتوانێت لە ڕووی ماددییەوە ئەو پلەوپایەیە بە دەست بهێنێت، دەتوانێ بە شێوەیەکی مەعنەوی - بە وێنەی ئەوەی بۆ ئەولیا و پیاوچاکان ڕوو دەدات - پێی بەهرەمەند ببێت. کەواتە ئێوە دەتوانن سوود لەم نیعمەتە وەربگرن کە پێتان بەخشراوە. دەسا خێراکەن کاری گەرموگوڕ ئەنجام بدەن و بە چوست و چالاکی لێ ببڕێن تاکو گۆی زەوی بە وێنەی باخچەیەکی بچووکی ڕەنگین بخەملێنن و هاتوچۆی تێدا بکەن و هەموو ڕووەکانی ببینن و هەواڵ و ڕووداوەکانی هەموو شوێنێکی تر ببیستن، بێ ئەوەی ئەرکی بەندایەتیتان لە یاد بچێت).

هەروەها سەرنج لەم ئایەتە پیرۆزە بدەن کە دەفەرموێت:

**﴿هُوَ الَّذي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾**(الملك:١٥).

بەم جۆرە بینیمان کە چۆن ئەم ئایەتە پیرۆزەی سەرەتای ئەم نموونەیە، هیممەتی مرۆڤ دەبزوێنێت و بایەخیشی تێدا دەبووژێنێتەوە بۆ دۆزینەوەی هۆکار و ئامێرێك لە نێوان وردترینی پیشەسازییەکانیدا، کە بە هۆیەوە بتوانێت لە دوورترین شوێنەوە ڕەنگەکان ئامادە بکات.

❍ نموونەیەکی تر:

**﴿وآخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي الأَصْفَادِ﴾** (ص:٣٨).

**﴿وَمِنَ الشَّيَاطِينِ مَنْ يَغُوصُونَ لَهُ وَيَعْمَلُونَ عَمَلاً دونَ ذلكَ وَكُنَّا لَهُمْ حافِظِينَ﴾**(الأنبياء:٨٢).

ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئەوە دەگەیەنن کە: جینیی و شەیتانەکان و ڕۆحیانەتە چەپەڵەکان، بۆ خەزرەتی سولەیمان - درودی لەسەر بێت - ژێربار و ملکەچ کرابوون و ڕێ لە شەڕ و

خراپکارییان گیرابوو، هەروەك لە چەندین کاروباری بەسوودیشدا بەکارهێنرابوو.
کەواتە ئەم ئایەتانە دەڵێن:

تاقمی جیننی، کە لە نێوان سەرنیشانی خاوەن هەست و شعووری گۆی زەوی‌دا ـ دوای ئادەمیزادەوە دێن و لە گرنگی و بایەخدا پلەی دووهەمیان هەیە، دەگونجێ بکرێن ـ خزمەتگوزاری مرۆڤ و پەیوەندی‌یان لەگەڵ ببەسترێت و چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ـ بکرێت. تەنانەت دەگونجێ کە شەیتانەکان دوژمنایەتی‌یان لەگەڵ مرۆڤدا بخەنە لاوە و ناچار بکرێن خزمەتی مرۆڤ بکەن. هەروەك خوای گەورە ژێربار و ملکەچی کردن بۆ یەکێك ـ بەندە ملکەچ و گوێڕایەڵەکانی فەرمانی خۆی.

واتە خوای گەورە، بە "واتای هێما"ی ئەم ئایەتانە، ڕووی گوفتار لە مرۆڤ دەکات و دەفەرموێت:

(ئەی مرۆڤ! من جیننی و شەیتانەکان و خراپکارانیانم بۆ بەندەیەکی گوێڕایەڵی خۆم ملکەچ و ژێربار کرد. تۆش ئەگەر "نەفس"ی خۆت بۆ گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی من ژێربار و ملکەچ بکەیت، ئەوا گەلێ بوونەوەری زۆرت تەنانەت جیننی و شەیتانەکانیشت بۆ ژێربار دەخەم).

کەواتە ئەم ئایەتە پیرۆزە هێڵی دوا سنوور دەکێشێت و باشترین ڕێگای بەکەڵکی سوود لێ وەرگرتن دەستنیشان دەکات. تەنانەت ڕێگایەکیش دەکاتەوە بۆ "ئامادە کردنی گیانەکان" و "گفتوگۆکردن لەگەڵ جیننی"دا، کە دەرەنجامی تێکەڵ بوونی هونەر و زانستەکانی مرۆڤە و لە هێز و هەست و نەستە نائاساییە ماددی و مەعنەوی‌یەکانیەوە دەرکەوتووە و سەری هەڵداوە. بەڵام نەك بەو جۆرەی کە لەم سەردەمەی ئێستە بەکاردەهێنرێت. چونکە ئەو مرۆڤانەی کە ئێستا لەم بوارانەدا کار دەکەن بوون بە گاڵتەجاڕ و مایەی پێ ڕابواردن لە لایەن ئەو جنۆکانەوە کە هەندێ جار ناوی کەسانی مردوو لە خۆیان دەنێن و ـ بە پێچەوانەی مەبەستەوە ـ خۆیان بوون بەگوێڕایەڵ و ڕامکراوی شەیتانەکان و ڕۆحیانەتە چەپەڵەکان! ئەوەی ئێمە لێی دواین جیاوازە لەمانە و، تەنها لەو ڕێگایەوە دەبێت کە بەهۆی نهێنی‌یەکانی قورئانی پیرۆزەوە ملکەچ بکرێن و ژێربار بخرێن و خراپە و زیانەکانیشیان مرۆڤ دەرباز بکرێت!

❍ پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزە:

﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيّاً﴾ (مریم:١٧)..

هەروەها ئایەتەکانی تری هاوچەشنی کە ئاماژە بۆ بەرجەستەبوونی ڕۆحیانەتەکان دەکەن و، ئەو ئایەتانەش کە ئاماژەیان تێدایە بۆ هێنان و ژێربارخستنی دێوەکان لە لایەن

حەزرەتی سولەیمانەوە - دروودی لەسەر بێت - هەروەك ئاماژە بۆ بەرجەستە بوونی ڕۆحانی‌یەکان دەکەن، لە هەمان کاتیشدا ئاماژەیان تێدایە بۆ ئامادە کردنی گیانەکان (تحضير الأرواح). بەڵام وریابە! ئامادەکردنی گیانە خاوێنەکان، کە ئەو ئایەتانە ئاماژەیان بۆ دەکەن، بەو شێوەیە نی‌یە کە هاوچەرخەکانمان گیانەکان بۆ شوێنی گەمە و گاڵتەی خۆیان دەهێنن و کارێکە سەرتاپا گاڵتە پێکردنێکی سووك و ڕسوای ئەوتۆیە کە لەگەڵ شان و شکۆی ئەو ڕۆحیانەتە جیددی و بەڕێز و خاوەن ویقارانەدا ناگونجێ، ئەوانەی کە جیهانێکیان ئاوەدان کردووەتەوە کە یەکپارچە کاری جیددی‌یە و جێی گەمە و گاڵتەی تێدا نابێتەوە..

بەڵێ مەبەست ئەوە نی‌یە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە دەکرێ "گیانەکان" بە جۆرێکی تر ئامادە بکرێن، بە وێنەی ئەوەی چەند ئەولیایەکی پیاوچاك بۆ مەبەستێکی گرنگ و ئامانجێکی بەرز و پێویست ئەنجامیان دا. وەك کەسانی هاووێنەی شێخ محێدینی عەرەبی، کە هەرکات بیانویستایە چاوپێ کەوتنیان لەگەڵ ئەو ڕۆحیانەتە خاوێنانەدا ساز دەکرد و، ئەمان بەرەو لای ئەو ڕۆحیانەتانە کێش دەبوون و پەیوەندی‌یان لەگەڵدا دەبەستن و بۆ شوێنەکانی ئەوان دەڕۆشتن و لە جیهانەکەیان نزیك دەبوونەوە و سوودیان لە ڕۆحیانەتی ئەوان وەردەگرت. تەنها ئەم ئامادە بوونی ڕۆحەیە کە ئەو ئایەتە پیرۆزانە ئاماژەی بۆ دەکەن و، لەم ئاماژەیەشدا هەست بە هاندان و تاسەبزواندنی مرۆڤ دەکرێت و، لە هەمان کاتیشدا هێڵی دوا سنووری ئەم چەشنە زانست و کارامەیی‌یە پەنهانە دەکێشێت و، جوانترین و باشترین شێوەشیان پێش‌چاو دەخات.

○ نموونەیەکی تر: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالإِشْرَاقِ﴾ (ص:١٨).

﴿يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ﴾ (سبأ:١٠).

﴿عُلِّمْنَا مَنْطِقَ الطَّيْرِ﴾ (النمل:١٦).

ئەم ئایەتە پیرۆزانەی کە موعجیزاتی حەزرەتی داوود - دروودی لەسەر بێت - باس دەکەن، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە هێندە هێزی مەزن و دەنگ و ئاوازی خۆش و جوانی بە زیکر و تەسبیحاتی حەزرەتی داوود بەخشیبوو کە تەنانەت چیاکانیشی دەهێنایە حاڵ و جەزبەی شەوق و تاسەمەندی، بە ڕادەیەك کە دەتوت چیاکان گرامافۆنێکی گەورەن و زایەڵەی زیکر و تەسبیحاتی ئەو دەڵێنەوە، یاخود دەتوت مرۆڤێکی گەورەن لەناو ئەڵقەی زیکرێکدا کە لە دوای سەرگەورەی ئەو ئەڵقەیەوە زیکرەکان دووپات دەکەنەوە!

- ئایا ئەمە حەقیقەتە؟ یان ئایا دەگونجێ شتی وا لە ڕاستی‌دا ڕوو بدات؟!

- بەڵێ، ڕاستی‌یەکی بێ گومانە. چونکە ئایا ناگونجێ کە هەر چیایەك ئەشکەوتی تێدا بێت لەگەڵ هەموو مرۆڤێکدا بە زمانی ئەو مرۆڤە بدوێ و بە چەشنی "تووتی" گوفتارەکانی

ئه‌و كه‌سه دووپات بكاته‌وه؟ خۆ ئه‌گه‌ر له‌ به‌رده‌م هه‌ر شاخێكدا وتت: "الحمد لله" ئه‌ویش به‌ ڕێی زایه‌ڵه‌ و ده‌نگدانه‌وه‌ی ده‌نگه‌كه‌ی تۆوه‌ ده‌ڵێت: "الحمد لله"..

جا ماده‌م خوای گه‌وره‌ ئه‌م توانا و لێهاتنه‌ی به‌ چیاكان به‌خشیبێت، ئه‌وا ده‌كرێت ئه‌و توانا و لێهاتنه‌ پتر ده‌ربخرێت و بكه‌وێته‌ ڕوو. خۆ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خوای گه‌وره‌ جگه‌ له‌ "پێغه‌مبه‌رایه‌تی" جێنشینیی زه‌ویشی - به‌ تایبه‌تی - به‌ حه‌زره‌تی داوود به‌خشیبوو، ئه‌وا تۆوی ئه‌و توانا و لێهاتنه‌ی كه‌ لای ئه‌و ده‌ری خست، پتر گه‌شه‌ی پێ سه‌ند و به‌ جۆرێكی ئیعجازبه‌خش خستیه‌ ڕوو، به‌ شێوه‌یه‌ك كه‌ له‌گه‌ڵ كاروبار و ئه‌ركی فراوانی "پێغه‌مبه‌رایه‌تی" و "فه‌رمانڕه‌وایه‌تی"ی ئه‌ودا بگونجێت، به‌ ڕاده‌یه‌ك كه‌ چیا سه‌خت و گه‌ردن كه‌شه‌كانیش، وه‌كو هه‌ر سه‌ربازێكی گوێڕایه‌ڵ و به‌ وێنه‌ی هه‌ر شاگردێكی گوێبیست له‌ به‌رده‌ستی‌دا و چه‌شنی هه‌ر موریدێكی خاوه‌ن نه‌وازش له‌ ئه‌ڵقه‌ی زیكری د. ملكه‌چی فه‌رمانه‌كانی ئه‌و بوون. به‌م پێیه‌، ئه‌و چیا مه‌زنانه‌ به‌ زمان و فه‌رمانی حه‌زره‌تی داوود - درووده‌ی له‌سه‌ر بێت - ته‌سبیحات و سوپاسگوزاریی به‌دیهێنه‌ری مه‌زنیان پێشكه‌ش ده‌كرد و، هه‌ر كه‌ حه‌زره‌تی داوود - درووده‌ی له‌سه‌ر بێت - زیكر و ته‌سبیحاتی ده‌ست پێ ده‌كرد، یه‌كسه‌ر چیاكانیش له‌گه‌ڵ ئه‌ودا هه‌مان زیكر و ته‌سبیحاتیان ده‌وته‌وه‌!

به‌ڵێ، سه‌ركرده‌ی سوپا ده‌توانێت له‌ ڕێی ئامێره‌كانی په‌یوه‌ندی و هۆكاره‌كانی ته‌له‌فۆنه‌وه‌ زمانی سه‌ربازه‌ په‌رش و بڵاوه‌كانی خۆی له‌ناو چیاكاندا به‌ زیكری "ألله أكبر" بخاته‌ گه‌ڕ، به‌ ڕاده‌یه‌ك ده‌ڵێی شاخه‌كان خۆیان سه‌رگه‌رمی ته‌هلیله‌ و وتنی "ألله أكبر"ن!

جا ئه‌گه‌ر سه‌ركرده‌یه‌كی ئاده‌می بتوانێت چیاكان له‌ شێوه‌یه‌كی مه‌جازی‌دا و به‌ زمانی سه‌رنیشنانی، بخاته‌ گوفتار، ده‌بێ سه‌ركرده‌یه‌كی به‌سام و شكۆی هه‌ڵبژارده‌ی خوای گه‌وره‌ چۆن بێت؟ ئایا ناتوانێت به‌ شێوه‌یه‌كی حه‌قیقی ئه‌و چیا و شاخانه‌ بخاته‌ گوفتار و ته‌سبیحاتی ڕاسته‌قینه‌؟.. ئه‌مه‌ سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ وته‌كانی پێشوودا ڕوونمان كردوه‌: هه‌موو چیایه‌ك خاوه‌نی كه‌سایه‌تی‌یه‌كی مه‌عنه‌ویی تایبه‌ت و ته‌سبیحاتێكی گونجاوی تایبه‌تی و عیباده‌تێكی شایسته‌ی تایبه‌ت به‌ خۆیه‌تی. كه‌واته‌ هه‌روه‌ك به‌ ده‌نگدانه‌وه‌ و زایه‌ڵه‌ی ده‌نگه‌كانی مرۆف هه‌موو چیایه‌ك ته‌سبیحات ده‌كات، هه‌ر بۆ خۆیشی، به‌ زمانه‌ تایبه‌تی‌یه‌كانی، ته‌سبیحاتی تایبه‌تی پێشكه‌شی به‌دیهێنه‌ری شكۆمه‌ندی خۆی ده‌كات.

○ هه‌روه‌ها: ﴿والطَّيْرَ مَحْشُورَةً﴾ (ص:١٩).

﴿عُلِّمْنَا مَنْطِقَ الطَّيْرِ﴾ (النمل:١٦).

ئه‌م ئایه‌تانه‌ ده‌ری‌ده‌خه‌ن كه‌: خوای گه‌وره‌ حه‌زره‌تی داوود و سوله‌یمانی فێری گوفتاری هه‌موو جۆره‌ باڵنده‌كان كردووه‌ و، له‌ زمانی توانا و لێهاتنیشیان شاره‌زای كردوون. و ته‌

ـەو کارانەی کە لەگەڵیاندا دەگونجێ و چۆنێتیی سوود لێ وەرگرتنیان، ئاگاداری کردوونەتەوە.

بەڵێ، ئەم حەقیقەتە ڕاستییەکی مەزنە. چونکە مادەم ڕووی زەوی سفرە و خوانێکی خواوەندی میهرەبانە و بۆ مەبەستی ڕێزنان لە مرۆڤ ڕاخراوە، ئەوا دەگونجێ زۆربەی ئەو ئاژەڵ و باڵندانەی کە سوود لەم سفرە وخوانە وەردەگرن، لە خزمەتی مرۆڤدا بن و بۆ ئیشوکارەکانی ئەو ژێربار خرابن..

چونکە ئەو مرۆڤەی کە خزمەتکارە بچووکەکانی چەشنی هەنگ و کرمی ئاورێشمی بۆ خۆی خستووەتەکار و، سوودی لە ئیلهامە خواییەکانی ئەوان وەرگرتووە و.. کۆتری نامەبەری لە هەندێ کاروباری خۆیدا بەکارهێناوە و.. تووتی و باڵندەکانی هاوچەشنی هێناوەتە قسە و گوفتار و، بەم کارەی گەلێ کردەوەی جوانی نوێی خستووەتە سەر شارستانێتیی خۆی.. ئەم مرۆڤە، هەروەك سوودی لە ئاژەڵە ماڵی و ڕامکراوەکان وەرگرت، دەشتوانێت گەلێ سوودی زۆری تری دەست بکەوێت گەر شارەزای زمانی توانا و لێهاتنی سروشتیی باڵندەکان و ئاژەڵەکانی تر بێت. چونکە باڵندە و ئاژەڵەکان گەلێ ڕەگەز و جۆری زەبەندە و جیاوازیان هەیە. بۆ نموونە: گەر مرۆڤ فێری زمانی توانا و لێهاتنی ئەو چەشنە چۆلەکانە بێت کە لە جۆری ڕیشۆڵەن و کوللە دەخۆن و ڕێ لە زیادبوونی دەگرن و، گەر بتوانێت کارەکانی ئەم چەشنە چۆلەکەیە ڕێك بخات و کۆنترۆڵی بکات، ئەوا دەتوانێت بۆ قەلاچۆکردنی کوللە بەکاریان بهێنێت! واتە ئەو کاتە مرۆڤ توانیویەتی سوود لەم جۆرە باڵندەیە وەربگرێت و لە چەندین کاروباری گرنگدا بە خۆڕایی بیانخاتە کار.

جا ئەم چەشنە سوود لێ وەرگرتن و بەکارهێنانەی توانا و لێهاتنی باڵندەکان و خستنە قسەی بێ گیانەکان (چەشنی تەلەفۆن و گرامافۆن) ئایەتە پیرۆزەکەی پێشوو هێڵی دواسنووری بۆ کێشاون.

کەواتە خوای گەورە بە "واتای هێما"ی ئەم ئایەتە پیرۆزانە دەفەرموێت:

(ئەی نەوەی ئادەم! یەکێك لە بەندە موخلیس و بێگەردەکانم، کە هاوڕەگەزی ئێوە بوو، گەلێ بەدیهاتووی مەزنم لە موڵکی خۆمدا بۆ ملکەچ و گوێڕایەڵ کرد و خستمنە قسە بۆی و کردمن بە چەند خزمەتگوزار و سەربازێکی دەستپاك و گوێڕایەڵ لە خزمەتی ئەودا، تاکو پێغەمبەرایەتییەکەی و دادگەرییەکەی لە سنووری فەرمانڕەوایی دەوڵەتەکەیدا بپارێزن. هەریەك لە ئێوەش چەندین توانا و لێهاتن و بەهرەم پێ بەخشیون تاکو ببن بە جێنشینی زەوی و، ئەمانەتێکی هێندە مەزنم پێ سپاردوون کە ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان

نەیانتوانی بیخەنە ئەستۆی خۆیانەوە. کەواتە دەبێ ئێوە ملکەچ و فەرمانبەرداری فەرمانەکانی ئەو خواوەندە بن کە جڵەوی ئەم بوونەوەرانەی لە دەستدایە، تاکو بوونەوەرە پەرش و بڵاوەکانی ناو موڵکی ئەو، جڵەوی خۆیان بدەنە دەستتان. کەواتە ئێوە ئەم ڕێگایەتان بۆ تەخت کراوە و دەرگاتان بۆ خراوەتە سەر پشت، گەر بتوانن بە ناوی بەدیهێنەری مەزنەوە جڵەوی ئەو بوونەوەرانە بگرنە دەست و، بۆ پلەیەکی ئەوتۆ بەرز ببنەوە کە شایانی بەهرە و لێهاتنەکانتان بێت.

مادەم ڕاستی بەم جۆرەیە، ئەوا تۆش ئەی مرۆڤ! بە گاڵتەو گەپ و کاری بێ واتا و بێ سوودی (چەشنی گرامافۆن و کۆتر و تووتی)یەوە خۆت خەریك مەکە، بەڵکو لە پێناوی بەدەستهێنانی گەمە و گاڵتەیەکی یەکجار نیان و خاوێندا هەوڵ بدە و، تامی خۆشترین و بەلەزەتترینی جۆرەکانی "تەسلیە" و دڵارامی بچێژە و، وەك حەزرەتی داوود - دروودی لەسەر بێت - چیاکان بکە بە گرامافۆنی دەنگدەرەوەی زیکرەکانت و، بە ئاوازی زیکر و تەسبیحی درەخت و ڕووەکەکانیش ئاوی گوێی خۆت بدە، ئەوانەی کە هەر ئەوەندەی سروەیەکیان بەر دەکەوێت یەکسەر بە وێنەی ژێی ئامێرە دەنگییەکان، دەنگی سازگار و ئاوازی نەرم و ناسکیان لێ بەرز دەبێتەوە..

بەم زیکرە بڵند و بەرزە، چیاکان هەزاران زمانی زیکرگۆی تەسبیحات گوزارت بەرچاو دەخەن و، لە ماهییەت و ناوەرۆکێکی گەلێ سەیری ناو بوونەوەرە سەرسووڕهێنەکاندا دەردەکەون. ئەو کاتە زۆربەی باڵندەکان - بە وێنەی پەپووی حەزرەتی سولەیمان، علیه السلام - پۆشاکی هاوڕێی ئازیز و هاودەمی خۆشەویست دەپۆشن و، دەبن بە خزمەتگوزاری گوێڕایەڵ بۆت و، دڵارامی و تەسلییەی بێ گەرد و گاڵتە و گەپی خاوێنت پێ دەبەخشن. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەم زیکرە بەرز و بڵندە دەتگەیەنێتە ئەوەی کە توانا و لێهاتن و بەهرە شارراوە و ئەسپەردە کراوەکانی ناو ماهییەتت ببووژێنەوە و، لەم ڕێیەوە نایەڵن لە پلەوپایەی بەرزی ماهییەتی مرۆڤانەت بکەویتە خوارەوە. ئیتر دوای ئەوە، جۆرەکانی گەمە و گاڵتەی بێ کەڵك و بێ سوود بەرەو بنکی شیو و دۆڵی پلە نزمەکان کێشت ناکەن)!

❍ نموونەیەکی تر:

﴿قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلاماً عَلَى إبراهيم﴾ (الأنبياء:٦٩).

ئەم ئایەتە پیرۆزە موعجیزەی حەزرەتی ئیبراهیم - دروودی لەسەر بێت - دەردەخات و سێ ئاماژەی ناسکیشی تێدایە:

**یەکەمیان:** ئاگر - وەك هەموو هۆکارێکی تر - جڵەوی خۆی بە دەستی خـۆی نی‌یە و بە هەڕەمەکی و ئـارەزووی خـۆی کـار ناکـات، بـەڵکو بـەپێی ئـەو فەرمانـەی بەسـەری‌دا دەسەپێنرێت، ئەرکی ئەستۆی ڕادەپەڕێنێت. ئەوەبوو حەزرەتی ئیبراهیمی نەسووتاند، چونکە فەرمانی نەسووتاندنی ئەوی پێ درا.

**دووهـەمیان:** پلەیەك لـە ئـاگردا هەیـە کـە بـەهۆی سـاردبوونی لەڕادەبـەدەری، شـتان دەسووتێنێت! واتە کاریگەریی چەشنی سووتانی لـێ دەبێتەوە. ئەوەتا خوای گەورە بە وشەی ﴿سَــلاماً﴾[1] لەگـەڵ پلـەی "ساردی"ی ئاگرەکـەدا دەدوێـت و پێـی دەفـەرموێت: هـەروەك گەرمی" ئیبراهیمی نەسووتاند، تۆیش مەیسووتێنە. واتە ئـاگر لـەو پلـەی ساردی‌یەدا دارای کاریگەری‌یەکی چەشنی سووتاندنە. کەواتە لە یەك کاتدا ئاگریشە و ساردیشە!

بەڵێ، وەك لـە زانستی "طبيعيــات"دا بـاس کـراوە، ئـاگر چـەند پلەیـەکی جیاجیـا و جۆراوجۆری هەیـە. یـەکێك لـەو پلانـە لـە شێوەی ئـاگرێکی سپی‌دایە، گەرمی‌یەکەی بڵاو ناکاتـەوە، بـەڵکو گـەرمی لـە دەوروبـەری خـۆی بەدەسـت دەهێنێـت و بـەم حاڵەتەشـی شـلەمەنی‌یەکانی دەوروبـەری دەخاتـە دۆخـی بەستنەوە! وەك بڵێـی بـە ساردی‌یەکەی شـتان دەسووتێنێت! "زەمهەریر"یش جۆرێکی ئاگرە و بە ساردی‌یەکەی شت دەسووتێنێت. کەواتە لە دۆزەخدا کە هەموو پلە و جۆرەکانی ئاگری تێدایە، بوونی زەمهەریر کارێکی پێویستە.

**سێ‌هەمیان:** هەروەك "ئیمان" کە "ماددەیەکی مەعنـەوی"یە و ڕێ لـە کاریگـەریی ئـاگری دۆزەخ دەگرێـت و موسـڵمانانی لـێ ڕزگـار دەکـات.. هـەروەها وەك "ئیسـلام"یـش کـە زرێ‌یەکی پارێزەر و قەڵایەکی قایم و مەحکەمە، موسڵمانان لە ئـاگر دەپـارێزێت.. بـە هـەمان جۆر، "ماددەیەکی ماددی"ش هەیە کە وەك زرێ ڕێ لـە کاریگـەریی ئـاگری دنیـا دەگرێـت. چونکە خوای گەورە لەم دنیایەدا، کە خانـەی دانستە، لەسـەر داخـوازی نـاوی "الحكيـم"ی خۆی و لە ژێر پەردەی هۆکارەکاندا کارەکانی بەڕێ دەکات. لەبەر ئەمـە، ئـەو ئـاگرەی کـە بۆ حـەزرەتی ئیـبراهیم - دروودی لەسـەر بێـت - ساز کـرا، هـەروەك جەسـتەی حـەزرەتی ئیبراهیمی نەسووتاند، بەرگ و پۆشاکەکانیشی نەسووتاند! کەواتە ئـەم ئایەتـە پیرۆزە هێمایـە بۆ ئەوەی کە:

(ئەی شوێنکەوتووان و میللەتی ئیبراهیم! چاو لە ئیـبراهیم بکـەن.. بـا "تـەقوا" پۆشـاکتان بێت کە پۆشاکی ئیبراهیم بوو.. لە بەرامبەر دوژمنە مەزنەکەتان، کە ئاگرە لە دنیا و قیامەتدا،

---

(١) یەکێك لە تەفسیرەکان دەڵێت: ئەگەر خوای گەورە نەیفەرموایە: ﴿سَلاماً﴾ ئـەوا سـاردیی ئاگرەکە حەزرەتی ئیبراهیمی دەسووتاند! (دانەر)

تەقوا بکەن بە زرێی پارێزەر و قەڵای مەحکەمتان. جا هەروەك ئەگەر پۆشاکی تەقوا و ئیمانتان بە باڵای ڕۆحتان پۆشی لە شەڕی ئاگری دۆزەخ ڕزگارتان دەکات، بە هەمان جۆر خوای گەورە چەند ماددەیەکی لەناو زەویشدا دروست کردووە کە لە زیانی ئاگر دەتانپارێزن. دەسا خێرا بکەن ئەو ماددانە بدۆزنەوە کە ڕێ لە گەرمی دەگرن و لەناو زەوی دەریان بهێنن و لەبەریان بکەن).

بەم جۆرە ،مرۆڤ لە ئەنجامی باس و لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەکانیدا، ماددەیەکی دۆزییەوە کە ئاگر نایسووتێنێت، بەڵکو بەرگری لە ئاگر دەکات و، مرۆڤ دەتوانێت بەرگ و پۆشاکی بۆ خۆی لێ بدوورێت.

ڕادەی بەرزی و بڵندیی ئەم ئایەتە پیرۆزە لەگەڵ دۆزینەوەی ئەم ماددە دژ بە ئاگرەی کە مرۆڤ دۆزیویەتیەوە بەراورد بکە و، ئنجا بزانە کە چۆن ئەم ئایەتە پۆشاکێکی ڕەنگینی دەرخست کە لە کارگەی: "حنیفـــاً مســـلماً"دا چنراوە و، هەرگیزاو هەرگیز نادڕێت و هەتاهەتایە پارێزگاریی قەشەنگی و جوانی‌یەکەی خۆی دەکات!

○ نموونەیەکی تر: ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾ (البقرة: ٣١).

ئەم ئایەتە پیرۆزە موعجیزەی هەرە مەزنی حەزرەتی ئادەم – دروودی لەسەر بێت – لە دەعوای "خەلافەتی هەرەمەزن"دا دەردەخات، کە بریتی‌یە لە: فێرکردنی ناوەکان(تعلیم الاسماء)..

جا هەروەك موعجیزاتی پێغەمبەرانی تر – درووديان لە سەر بێت – هێما بوون بۆ چەند کارێکی دەراسا و تایبەتبوون بە هەریەك لەو پێغەمبەرانە، موعجیزەی باوکی پێغەمبەران و فاتیحی دیوانی پێغەمەبەرایەتی: حەزرەتی ئادەمیش – دروودی لەسەر بێت – ئاماژەیەکی تەواو نزیك لە ڕاشکاوی‌یەوە بۆ ئەوپەڕی کەماڵی بەشەری و پێشکەوتنەکانی و دەستکەوت ئامانج و مەبەستەکانی، دەکات. وەك بڵێی خوای گەورە لە ڕێی "واتای ئاماژەیی"ی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە، دەفەرموێت:

(ئەی نەوەی ئادەم! سەرکەوتنی باوکە ئادەمتان – لە دەعوای خەلافەتدا – بەسەر مەلائیکەتاندا بە هۆی فێربوونی هەموو ناوەکانەوە بوو کە من فێرم کردبوو. خۆ ئێوەش نەوە و میراتگری توانا و بەهرەکانی ئەون. دەسا هەموو ناوەکان فێر ببن، تاکو لە بەردەم هەموو بوونەوەراندا شایستەیی‌تان بۆ هەڵگرتنی ئەمانەتە هەرە مەزنەکە بچەسپێنن.. ئەوەتا ڕێگاتان بۆ تەخت کراوە کە بگەن بە بەرزترینی پلەوپایەکانی ناو گەردوون و، ئەم زەویەش بەدیهاتووە زەبەلاحەشتان بۆ ڕام و گوێڕایەڵ کراوە.. دەسا ڕاپەڕن و هەنگاو بنێن

ڕێگاتان لە بەردەمدا کراوەتەوە.. دەست بـە هـەموو یـەکێك لـە نـاوە جوانەکانمەوە بگـرن بـا بـەرز ببنەوە. بەڵام وریـا بـن! شـەیتان یـەك جـار باوکتـانی لەخشـتەبرد و لـەو پلـە بـەرزەی بەهەشتەوە، بـە شێوەیەکی کـاتی، هێنرایـە خـوار بۆ زەوی. کەواتـە نەکەن لـە پێشـکەوتن و بەرەوپێش‌چوونتاندا شوێن‌پێی شەیتان هەڵگرن. چونکە دەبێت بە مایەی پێ تـرازان و کەوتنـە خوارەوەتـان لـە ئاسمانـەکانی حیکمـەتی خواوەنـدەوە بـەرەو گومڕایـی مـاددیی سروشـتی.. ســەرتان بـەرز بکــەنەوە و ڕوانـین و بیرتـان بـە وردی ئاراستـەی نــاوە جوانــەکانم بکــەن و، زانست و پێشکەوتنتان بکەن بە چەند پەیژە و پلیکانەیەك بۆ مەبەستی سەرکەوتن بـەرەو ئـەو ئاسمانانە، تاکو بگەن بـە "حەقیقـەت"ی کـەماڵ و ڕاستی و سـەرچاوە ئەسـڵی و ڕەسـەنەکانی زانستەکانتان کـە نـاوە جوانـەکانمن. ئـەو کاتــەش بـە چاویلکـەی ئـەو ناوانـە و بـەصیرەتی دڵەکانتان بۆ پەروەردگارتان بڕوانن).

## ڕوونکردنەوەی سەرنجێکی گرنگ و نهێنی‌یەکی گرنگتر

لەو ڕووەوە کە خوای گەورە چەندەها توانا و لێهاتنی لە مرۆڤـدا کۆ کردووەتـەوە، ئـەوا هــەرچی کــەماڵی زانســتی و پێشــکەوتنی هونــەری و کــارە دەراســاکانی دۆزینــەوە و تەکنۆلۆژیای مرۆڤ هەن، ئەم ئایەتە پیرۆزە بە تەعبیری "ناو فێرکردن": ﴿**وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّها**﴾ هەموویانی دەربڕیوە. ئەم گوزارشت و شێوە دەربڕینە هێمایەکی بـەرز و وردی تێدایـە کە بریتی‌یە لەوەی:

هــەموو کــەماڵ و، زانســت و، پێشــکەوتن و، هونــەرێك - هەرچی‌یــەك بێــت - "ڕاستی"یەکی بەرز و بڵندی هەیە، ئەو ڕاستی‌یەش پاڵی بە یەکێك لە ناوە جوانـەکانی خـوای گـەورەوە داوە، بـەم پاڵدانەوەیەشـی بـەو نـاوەی کـە دارای چـەندین پـەردەی جیــاواز و جۆراوجۆر و بازنەی جیاجیای دەرکەوتنە، هەر یەك لەو هونەر و کـەماڵ و سنعەتە، کـەماڵی خۆی دەست دەکەوێت و دەبێـت بـە ڕاستی‌یەکی ڕەسـەن و ڕاستەقینە. دەنـا هەریەکـەیان سێبەرێکی ناتەواوی، قرتاوی، کزی، تێکەڵوپێکەڵ دەردەچێت.

بۆ نموونە: ئەندازە(الهندسة) یەکێکە لـە زانستـەکان. "ڕاسـتی" و "ئەوپـەڕی ئامـانجی" ئـەم زانستە لە گەیشتنـدایە بە ناوی جوانی "العدل والمقدر"ی خوای گەورە و، بینینی درەوشـانەوە پڕ لە دانایی‌یەکانی ئەو ناوە پـیرۆزە - بـە هـەموو مـەزنی و سـامێکیەوە - لـە ئاوێنـەی زانستی "ئەندازە"دا.

هه‌روه‌ها – بۆ نموونه – "پزیشكی"(الطب) زانست و كارامه‌یی و پیشه‌یه له‌ هه‌مان كـاتدا. ناوه‌رۆك و ڕاستیی ئه‌م زانسته‌ پاڵی به‌ یه‌كێك لـه‌ نـاوه‌ جوانـه‌كانی خـوای گـه‌وره‌وه‌ داوه‌ كـه‌ نـاوی: "الشافـي"یـه‌. جـا بـه‌ بینینـی دره‌وشـانه‌وه‌ میهره‌بانـه‌كانی نـاوی: "الشافـي"ی خـوای گـه‌وره‌ لـه‌ ده‌رمانـه‌ پـه‌رش و بڵاوه‌كـانی ڕووی زه‌وی‌دا – كـه‌ ده‌رمانخانه‌یـه‌كی مه‌زنـه‌ – ئـه‌م زانستی پزیشكی‌یه‌ به‌ كه‌ماڵی خۆی ده‌گات و ده‌بێت به‌ ڕاستی‌یه‌كی ڕاسته‌قینه‌.

هه‌روه‌ها ئه‌و زانستانه‌ی كه‌ له‌ ڕاستی‌یه‌كانی بوونه‌وه‌ران ده‌دوێن، وه‌ك: (فیزیا و كیمیـا و ڕووه‌كزانی و زینده‌وه‌رزانی) كه‌ چه‌ند زانستێكن له‌ ڕاستی‌دا (دانسـتی شـتان)ن.. ده‌گونجـێ ئه‌مانـه‌ ببن بـه‌ "زانستی ڕاسته‌قینه‌". ئه‌مـه‌ش بـه‌ بینینـی دره‌وشـانه‌وه‌ هـه‌ره‌ مه‌زنـه‌كانی نـاوی: "الحكیـم"ی خـوای گـه‌وره‌ لـه‌ شتاندا، وه‌ك دره‌وشـانه‌وه‌كانی: كارسـازی و، پـه‌روه‌رده‌ و، چاودێری و، بینینی سوود و به‌رژه‌وه‌ندی‌یه‌كانی ئه‌م دره‌وشانه‌وانه‌ له‌ هه‌موو شتێكدا. واته‌: به‌ پاڵدانه‌وه‌ی ئه‌م زانستانه‌ به‌ ناوی "الحكیم"ی خـوای گـه‌وره‌وه‌ ئـه‌و دانسته‌ ده‌بێـت بـه‌ دانـایی ڕاسته‌قینه‌.. ده‌نا یان ده‌بن به‌ چه‌ند خورافه‌تێك كه‌ هیچ كه‌ڵك و سوودێكیان نه‌بێت، یـان ڕێ بۆ گومڕایی ته‌خت ده‌كه‌ن، وه‌ك ئه‌وه‌ی له‌ فه‌لسه‌فه‌ی ماددیی سروشتی‌دا به‌دی ده‌كرێت.

وا ئه‌م سێ نموونه‌یه‌مان بۆ باس كردیت. تۆیش بۆ خۆت زانست و هونه‌ر و كه‌ماڵاتـه‌كانی تریان له‌سه‌ر قیاس بكه‌.

به‌م جۆره‌، قورئانی پیرۆز به‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌ی خۆی، ده‌ستی هاندان و ته‌شویق به‌سه‌ر پشـتی گرۆی مرۆڤدا ده‌هێنێت و، ئاماژه‌ بۆ به‌رزترین و دوورترین سنوور ده‌كات كه‌ له‌ پێشـكه‌وتنی ئێستای‌دا گه‌لـێ كه‌مته‌رخه‌میی تێـدا نوانـد و پێیـان نه‌گه‌یشـت. وه‌ك بڵێـی قورئـانی پـیرۆز بـه‌ گرۆی مرۆڤ بڵێت: خێراكه‌.. پێشكه‌وه‌.. هه‌نگاو بنێ!

لێره‌دا به‌م گه‌وهه‌ره‌ به‌نرخه‌ی گه‌نجینه‌ هه‌ره‌ مه‌زنه‌كـه‌ی ئـه‌م ئایه‌تـه‌ پـیرۆزه‌، واز ده‌هێنـین و ئه‌م ده‌رگایه‌ داده‌خه‌ین.

نموونه‌یـه‌كی تـر: كۆتایی‌هێنـه‌ر بـه‌ دیوانـی پێغه‌مبه‌رایـه‌تی و پێشـه‌وای پێغه‌مبـه‌ران ﷺ كـه‌ سـه‌رجه‌م موعجیزاتی هـه‌موو پێغه‌مبـه‌رانی تـر بـه‌ ته‌نهـا یـه‌ك موعجیـزه‌ی ته‌سـدیقی ده‌عـوای پێغه‌مبه‌رایه‌تیی ئه‌و داده‌نرێن و.. كه‌ مایه‌ی شانازیی هه‌موو جیهانه‌كانـه‌ و.. ئایـه‌تی ئاشكرا و ڕوونكه‌ره‌وه‌ی سه‌رجه‌م پله‌ و پایه‌كانی ناوه‌ جوانه‌كانی خوای گه‌وره‌یه‌، ئه‌و ناوانـه‌ی كه‌ بـه‌ كورتی و پوختی خوای گـه‌وره‌ حـه‌زره‌تی ئـاده‌می لـێ فێـر كـردن.. ئـه‌م محه‌ممـه‌ده‌ پێغه‌مبـه‌ر و خۆشه‌ویسته‌ی خۆی ﷺ كـه‌ بـه‌ شـكۆمه‌ندی(جـلال)ی خـوای گـه‌وره‌، په‌نجـه‌ی خـۆی بـه‌رز كردووه‌ و مانگی دووله‌ت كرد و، هه‌ر هه‌مان په‌نجه‌شی نـه‌رم كـردووه‌ و بـه‌ جوانـی(جـمال)ی

خوای گەورە، ئاوی کەوسەر ئاسای هەڵقوڵاند و.. گەلێ موعجیزەی تری وەك ئەمانەی کە لە هەزار دانە تێپەڕ دەبن، ئاشکرا کرد.. ئەم پێغەمبەرە ئازیز و گەورەیە ﷺ قورئانی پیرۆزی بە چەشنی موعجیزەی گەورەی خۆی خستووەتە ڕوو، تەحەددای جیننی و ئادەمیزادیشی بەم قورئانە کردووە کە دەفەرموێ:

﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَـذَا الْقُرْآنِ لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً﴾ (الإسراء:٨٨).

جا ئەم ئایەتە پیرۆزە و ئایەتەکانی تری هاوچەشنی، سەرنجی جیننی و ئادەمیزاد بۆ درەخشانترین و زەقترینی ڕووەکانی ئیعجاز لەم موعجیزە نەمرە هەمیشەیی‌یەدا ڕادەکێشن و، ئاوڕیان پێ دەدەنەوە بۆ لای ئەو ڕەوانی‌یە حەق و ڕاستەقینەیەی کە لە ڕوونکردنەوەکانی‌دا هەیە و ئەو ڕەوانبێژی‌یە بەرزەی کە لە دەربڕینەکانی‌دا بە ئاشکرا دیارە و، ئەو شموول و هەمەلایەنگیری‌یەی لە واتاکانی‌دان و ئەو بەرزی و سازگاری‌یەش کە لە شێوازە جۆراوجۆرەکانی‌دا دەردەکەون. ئەوەتا قورئانی پیرۆز لە کاتی نازڵ بوونیەوە تا ئێستا و تا دنیاش دنیایە، تەحەددای سەرجەمی جیننی و ئادەمیزاد دەکات و، شەوق و تاسەمەندیی لایەنگرانی دەبزوێنێت و، سەرسەختی و عینادی نوستووی دوژمنانی بەخەبەر دێنێت و، بە شەوقێکی گەورە و هەڕەشەیەکی توندوتیژ هانی هەموویان دەدات کە لاسایی بکەنەوە و هاووێنەی قورئان پەیدا بکەن. تەنانەت خوای گەورە ئەم موعجیزە هەرە مەزنە لە جێگایەکی بەرزدا دەخاتە پێش‌چاوی خەڵکی. وەك بڵێی تاکە ئامانجی هاتنی مرۆڤ بۆ دنیا ئەوە بێت کە ئەم موعجیزە هەرە مەزنە بکات بە دەستووری ژیان و ئامانجی ئاواتەکانی.

**لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

هەریەکە لە موعجیزاتی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - ئاماژە بۆ یەکێك لە کارە دەراساکانی تەکنۆلۆژیای مرۆڤ دەکەن. بەڵام موعجیزەکەی حەزرەتی ئادەم - دروودی لەسەر بێت - ئاماژە بۆ پێڕستی سەرجەم کارە دەراساکانی کەماڵات و هونەر و زانستەکان دەکات و، شەوقی مرۆڤ بۆ هەموویان دەبزوێنێت، جگە لەوەی کە زۆر بە پوختی ئاماژەشی تێدایە بۆ بناغەکانی پیشەسازی.

موعجیزە هەرەمەزنەکەی پێغەمبەری مەزن حەزرەتی محەممەدیش ﷺ کە قورئانی پیرۆزی خاوەن ڕوونکردنەوەی ئیعجازبەخشە، لەبەر ئەوەی ڕاستیی فێرکردنی ناوەکان(تعلیم

الاسماء)ی بەوپەڕی ڕوونی و درێژەپێدانێکی تەواوەتی تێدا دەرکەوتووە، ئەوا ئامانجە ڕاستەکانی هونەر و زانستە ڕاستەقینەکان و کەمالات و بەختەوەریی هەردوو دنیای زۆر بە ئاشکرایی ڕوون کردووەتەوە و، مرۆڤیان بۆ لا ئاراستە دەکات و ڕەغبەت و ئارەزوویی توندیان تێدا دەورووژێنێت. بە ڕادەیەك کە بە شێوازی هاندان و تەشویق ڕوونی دەکاتەوە کە:

(ئەی مرۆڤ! ئامانجی هەرەبەرزی بەدیهێنانی گەردوون بریتی‌یە لەوەی کە تۆ لە بەرامبەر دەرکەوتنی پەروەردگاریتیی خواوەندەوە، بەندایەتی‌یەکی گشتی و هەمەکی ئەنجام بدەیت ئامانجی سەرەکیی بەدیهاتنی تۆش لەوەدایە کە لە ڕێی زانست و کەمالاتەکانەوە بگەیتە پلەوپایەی ئەو بەندایەتی‌یە)!

قورئانی پیرۆز - لەم بوارەدا - گەلێ دەربڕینی جۆراوجۆری ڕەنگین و ئیعجاز بەخشی هەیە و، ئاماژەیان پێ دەکات بۆ ئەوەی کە:

گرۆی مرۆڤ، لە دوارۆژگارەکانی ژیانی سەر زەوی‌دا، ڕوو لە زانستەکان دەکات و ئاوڕ لە هونەرەکان دەداتەوە و هەموو هێزێکی لەو هونەر و زانستانەوە وەردەگرێت و لەو ڕێیەوە "زانست" جڵەوی هێز و فەرمانڕەوایی دەگرێتە دەست.

ئنجا دەبینیت قورئانی پیرۆز لە پێشدا ڕەوانیی "بەیان" و ڕەوانبێژیی "گوفتار" پێشدەخات و زۆر جار دووپاتیان دەکاتەوە، وەك بڵێی بەم کارەی هێما دەکات بۆ ئەوەی کە ڕەوانبێژی و ڕەوانیی گوفتار - کە درەخشانترینی هونەر و زانستەکانن - لە ئاخر زەمان جوانترین پۆشاك و ڕەنگینترین شێوەیان دەپۆشن، بە ڕادەیەك کە خەڵکی ئەو سەردەمە ڕۆژگارە تیژترین چەکی خۆیان لە ڕەوانی و سیحری "بەیان"دا بەدەست دەهێنن و سامناکترین هێزیشیان لە ڕەوانبێژیی گوفتار و دەربڕیندا وەردەگرن، کاتێ کە بیر و باوەڕەکانیان ڕوون دەکەنەوە و دەیانەوێت قەناعەتیش بە کەسانی تر ببەخشن، یان کاتێ کە ڕا و بڕیارەکانیان لە زەمینەی واقیعدا پیادە و جێبەجێ دەکەن!

**پوختەی ئەمانەی پێشوو:**

زۆربەی ئایەتە پیرۆزەکان، کلیلی خەزێنەی کەماڵێکی بەرز و گەنجینەیەکی زانستیی مەزنن. گەر حەز دەکەیت بگەیتە ئاسمانەکانی قورئانی پیرۆز و ئەستێرەی ئایەتەکانی، ئەوا هەر (بیست وتەکانی پێشوو) بکە بە بیست پلەی پلیکانەیەك تاکو بگەیتە ئەوێ[1] ئنجا بە

---

(١) تەنانەت هەر (سی و سێ وتە) و (سی و سێ مەکتووب) و (سی و یەك بریسکە) و (سیازدە تیشك)ەکە.

بیست وتەیە مەودای درەخشانیی خۆری قورئانی پیرۆز ببینە و، سەرنج بدە و بزانە کە چۆن قورئانی پیرۆز ڕووناکیی خۆی بەسەر ڕاستییەکانی ئولووهییەت و ڕاستییەکانی بوونەوەراندا پەخش دەکات و، چۆن ڕووناکییە درەخشانەکەی سەرجەمی بوونەوەران دەگرێتەوە.

**ئەنجام:**

مادەم ئەو ئایەتانەی کە تایبەتن بە موعجیزاتی پێغەمبەرانەوە - درووودیان لەسەر بێت - جۆرە ئاماژەیەکیان بۆ کارە دەراساکانی پێشکەوتن و زانستی و پیشەسازیی ئێستا تێدایە و، جۆرە تەعبیرێکیان بەکار هێناوە دەڵێی دوا سنووری ئەو زانست و پیشەسازییانە دەستنیشان دەکەن.. مادەم بێ هیچ گومانێکیش چەسپاوە، تەنانەت زانایان ڕاوبۆچوونیان لەوەدا یەکانگیر بووە کە هەموو ئایەتێك دارای گەلێ دەلالەتن لەسەر چەندین واتای جۆراوجۆر.. مادەم چەندەها فەرمانی ڕەها بۆ مرۆڤ دەرکراوە کە شوێن پێی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - هەڵبگرن و چاویان لێ بکەن..

ئەوا دەتوانرێت بوترێت:

هاودەم لەگەڵ ئەو واتا ڕاشکاوانەی کە ئایەتەکانی پێشوو دەیاندەن بە دەستەوە، بە شێوازی "ئاماژە"ش گەلێ دەلالەتی شەوقبەخش و هاندەریشیان تێدایە بۆ گرنگترین زانست و تەکنۆلۆژیای ئادەمیزاد.

## دوو وەڵامی گرنگ بۆ دوو پرسیاری سەرنج ڕاکێش

**❖ پرسیاری یەکەم:**

ئەگەر دەڵێیت: خۆ قورئانی پیرۆز لەبەر مرۆڤ نازڵ بووە، ئەدی بۆچی بە ڕاشکاوی لە کارە دەراساکانی شارستانێتیی نوێ نادوێت، کە بەلای مرۆڤەوە زۆر گرنگن.. بەڵکو تەنها بە "هێمایەکی سادە" یان "ئاماژەیەکی پەنهان و ناسك" یان "بێدارییەکی لاواز" بەسەریان دەکات؟

**وەڵام:**

کارە دەراساکانی شارستانێتیی مرۆڤ بەلای قورئانەوە شایانی لەوە زیاتر نین. چونکە ئەرکی سەرەکیی قورئانی پیرۆز بریتییە لەوەی کاروبار و کەماڵاتی "بازنەی

---

پەیژەیەکی سەد و بیست پلیکانەیی پێکدەهێنن بۆ ئەو بەرزبوونەوەیە. (دانەر)

پەروەردگاریتی" و کارمەندی و ئەرك و حاڵەتەکانی "بازنەی بەندایەتی" فێری گرۆی مرۆڤ بکات.

لەبەر ئەوە، ماف و بەشی کارە دەراساکانی مرۆڤ لەو دوو بازنەیەدا، جگە لە هێمایەکی لاواز و ئاماژەیەکی پەنهان چیی تر نییە. دەنا گەر ئەو کارە دەراسایانە داوای مافی خۆیـ لە: "بازنەی پەروەردگاریتی" بکەن، تەنها ماف و بەشێکی کەمیان دەکەوێت..

بۆ نموونە: ئەگەر فڕۆکەی دەستکردی مرۆڤ[1] داوا لە قورئانی پیرۆز بکات و بڵێت:

- "مافی باسکردن و جێگایەکم لە نێوان ئایەتەکاندا بدەرێ"..

ئەوا فڕۆکەکانی بازنەی پەروەردگاریتی - کە زەوی و مانگ و سەرجەم هەسـ..ـرە گەڕۆکەکانن - لێی ڕادەپەڕن و، بە زمانی قورئانی پیرۆزەوە پێی دەڵێن:

- (تۆ تەنها بە ئەندازەی قەبارەکەت دەتوانیت جێگای خۆت لێرەدا بگریت، نەك زیاتر)

هەروەها ئەگەر کەشتیی بنەدەریایی(غەوواصە)ی دەستکردی ئادەمیزاد بیەوێت لە نێو ئایەتە پیرۆزەکاندا جێگایەك بۆ خۆی پەیدا بکات، ئەوا غەوواصەکانی ئەو بازنەیە (کە بریتین لە گۆی زەویی مەلەوانی ناو زەریای هەوا و، ئەو ئەستێرانەش کە سەر دەریای "أثیر" کەوتوون) لێی دێنە پێش و پێی دەڵێن:

- (جێی تۆ لە نێوان ئێمەدا هێندە بچووکە وەختە هەر بە چاو نەبینرێت)!

هەروەها ئەگەر "کارەبا" بە خۆی و چرا پرشنگدارەکانیەوە، کە وەك ئەستێرە و..ـە، بیەوێت بڕواتە ناو حەرەمی ئایەتەکانی قورئانەوە، ئەوا چراکانی ئەو بازنەیە - کە بریتین لە خۆر و گەلەستێرە و ئەستێرەکانی ڕازێنەری ئاسمان - بەرپەرچی دەدەنەوە و دەڵێن:

- (تۆ تەنها بە ئەندازەی ڕووناکییەکەی خۆت دەتوانیت لەگەڵ ئێمەدا بێیتە ناو باس و لێدوانەکانی قورئانەوە)!!

هەروەها ئەگەر کارە دەراساکانی شارستانیتی، بە زمانی سنعەتە وردەکان، داوای مافی خۆیان بکەن و جێگایەکیان بوێت لە نێوان ئایەتەکاندا، ئەوا تەنها یەك دانە مێش دەچێتە بەگژیاندا و، دەڵێت:

- بێدەنگ بن! ئێوە تەنانەت بە ئەندازەی یەك دانە باڵیشم مافی قسەتان نییە! چونکە ئەگەر سەرجەمی داهێنان و سنعەتەکانتان، کە بەهۆی دەستکەوتی ویستی هەندەکیی مرۆڤەوە دۆزراونەتەوە، هاودەم لەگەڵ هەموو ئامراز و ئامێرە وردەکانتاندا کۆ بنەوە، هێشتـ

---

(١) لەم بازنە و باسە جیددییەدا قەڵەم - بێ ویستی خۆم - بەرەو ئەم گفتوگۆ نیانە ملی نا و، منیش وازم لێ هێنـ هیوادارم نیانیی ئەم شێوازە جیددییەتی بابەتەکە نەشێوێنێت. (دانەر)

بە ئەندازەی ناسكیی كۆئەندامەكان و وردەكاریی سنعەتی جەستەی من سەرسووڕهێنەرتر دەرناچن! ئەوەتا ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە هەمووتان بێدەنگ دەكات:

﴿إِنَّ الَّذينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَاباً وَلَواجْتَمَعُوا لَهُ وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبابُ شَيْئاً لا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطالِبُ والْمَطْلُوبُ﴾ (الحج:٧٣).

ئنجا ئەگەر ئەو كارە دەراسایانە بۆ "بازنەی بەندایەتی" بڕوانن و داوای مافی خۆیانی لێ بكەن، ئەوا وەڵامێكی وەك ئەمەی خوارەوەی لێ وەردەگرن:

– (پەیوەندیی ئێوە لەگەڵ ئێمەدا زۆر كەم و لاوازە. ئێوە ناتوانن بە ئاسانی بێنە ناو بازنەكەمانەوە، چونكە ڕێبازی ئێمە بریتی‌یە لەوەی كە:

دنیا میوانخانەیە و، مرۆڤ بۆ ماوەیەكی كەم بە میوانی تیایدا دەمێنێتەوە. لەو ماوە كەمەشدا گەلێ ئەركی زۆری خراوەتە ئەستۆ و دەبێ لەم تەمەنە كورتەدا سەرجەم پێداویستی‌یەكانی ژیانی هەتاهەتایی ئامادە بكات. لەبەر ئەوە، دەبێ مرۆڤ ئەو شتانە پێش بخات كە لە هەموو شتێكی تر گرنگتر و پێویستترن..

كەچی ڕوخساری زۆربەی ئێوە وا دێتە پێش‌چاو كە لە ژێر پەردەی غەفڵەت و گاڵتەوگەپی بێهوودەدا بە خۆش ویستنی دنیا چنرابێت. وەك بڵێی دنیا بەلاتانەوە خانەی مانەوە و مەڵبەندی نەمری بێت. لەبەر ئەوە، بەشی ئێوە لە ناوەندی "بازنەی بەندایەتی"دا – كە لەسەر بناغەی ڕێنمایی حەق و بیركردنەوە لە ئاسەوارەكانی دوارۆژدا بنیات نراوە – زۆر زۆر كەمە.

بەڵام ئەگەر لەناو ئێوەدا یان لە پشتی ئێوەوە چەند پیشەسازێكی كارامە و چەند داهێنەرێكی خاوەن بەهرە و ئیلهام بۆكراو هەبن – كە ئەمانەش زۆر كەمن – و كارەكانیان بە بێ گەردی و بە مەبەستی سوودگەیاندن بە بەندەكانی خوا، ئەنجام بدەن – كە ئەمەش بەندایەتی‌یەكی بەنرخە – و لەبەر حەوانەوە و بەرژەوەندیی خەڵكی و ئامانجی پێشكەوتن و كەماڵی ژیانی كۆمەڵایەتی ماندوو ببن و بۆ كارەكانیان لێ ببڕێن، ئەوا ئەم هێما و ڕێنمایی‌یانەی قورئانی پیرۆز – بێ هیچ گومانێك – سەروزیادی ئەو مرۆڤە هەست ناسكانەیە و بەسە بۆ ئەوەی كە ڕێز لە كارامەیی ئەوان بنێت و بۆ تێكۆشان وماندوو بوون لەو بوارانەدا هانیان بدات).

**❖ پرسیاری دووهەم:**

ئەگەر دەڵێیت:

(دوای ئـه‌م لێكـۆڵینه‌وه‌یه‌ هیـچ گـومانێكم لـه‌ دڵـدا نـه‌ما. چونكــه‌ بـه‌ دڵنیایی‌یـه‌وه‌ بـۆم چه‌سپا و بـه‌ دڵ ته‌سـدیقی ئـه‌وه‌م كـرد كـه‌: قورئـانی پـیرۆز سـه‌رجه‌م پێداویسـتی‌یه‌كانی به‌خته‌وه‌ریی دنیـا و قیامـه‌تی تێدایـه‌، هه‌ریه‌كـه‌یان بـه‌ گوێـره‌ی نـرخ و گرنگیـی خـۆی. ئه‌وه‌ته‌ گه‌لـێ هێما و ئاماژه‌ له‌ قورئانی پـیرۆزدا هـه‌ن سـه‌باره‌ت بـه‌ كـاره‌ ده‌راسـاكانی شارستانێتیی نوێ. ته‌نانه‌ت سه‌رباری ڕاستی‌یه‌ گرنگه‌كانی، ئاماژه‌شی تێدایه‌ بۆ گه‌لـێ ڕاستیی تـری جگـه‌ له‌وانه‌ش.. به‌ڵام ئایا بۆچی قورئانی پیرۆز به‌ ڕاشكاویی ته‌واو له‌و كـاره‌ ده‌راسایانه‌ نـادوێت. تاكو كافره‌ سـه‌رسـه‌خته‌كان ناچـاری ته‌سـدیق و باوه‌ڕهێنـان بكـات و، دڵـی ئێمـه‌ش دڵنیـا ببێت و بحه‌وێته‌وه‌)؟

**وه‌ڵام:**

"ئایین" ئیمتیحانـه‌ و، داخـوازی و ته‌كلیفـه‌كانی خـوای گـه‌وره‌یش تاقیكردنـه‌وه‌ن، تـاكو ڕۆحیانه‌ته‌ "به‌رز" و "نزمه‌كان" پێشبڕكێ بكه‌ن و له‌ ئه‌نجامدا له‌ یه‌ك جیا ببنه‌وه‌!

به‌ڵێ، هه‌روه‌ك كانزا به‌ ئاگر تاقی ده‌كرێته‌وه‌ تاكو "ئه‌ڵماس" له‌ "خه‌ڵووز" و "زێڕ"یش لـه‌ "خاك" جیا بكرێنـه‌وه‌، داخـوازی و ته‌كلیفـه‌كانی خواوه‌ندیـش لـه‌م خانـه‌ی تاقیكردنه‌وه‌یـه‌ی دنیادا، به‌ هه‌مان جۆرن، تاكو ئه‌م دنیایه‌ ببێت به‌ بواری تاقیكردنـه‌وه‌ و مـه‌یدانی پێشبڕكێ بۆ ئه‌وه‌ی گه‌وهه‌ره‌ گرانبه‌هاكانی كانگای فیتره‌تی مرۆڤ له‌ كانزا بێ‌نرخه‌كان جیا بكرێنه‌وه‌!

جا مادەم قورئانی پیرۆز لـه‌م خانه‌ی تاقیكردنه‌وه‌یه‌ی دنیا له‌ شێوه‌ی ئیمتیحـاندا بـۆ مـرۆڤ نازڵ بووه‌، تاكو لـه‌م مـه‌یدانی پێشـبڕكێ‌یه‌دا خـۆی بێ‌بگه‌یـه‌نێت، ئـه‌وا ده‌بێ ته‌نـها بـه‌ ئاماژه‌ كـردن لـه‌و كاروبـاره‌ غه‌یبی‌یانـه‌ی دنیـا بدوێـت كـه‌ لـه‌ پاشـه‌ڕۆژدا بــه‌ ئاشـكرا بـۆ هـه‌موان ده‌رده‌كـه‌ون.. ده‌رگایـه‌كیش بـۆ عـه‌قڵ ده‌كاتـه‌وه‌ كـه‌ بـه‌ ئـه‌ندازه‌ی چه‌سپاندنی به‌ڵگـه‌كانی بێت..

ده‌نا گه‌ر قورئانی پیرۆز ئه‌و شتانه‌ی بێ په‌رده‌ و ڕاسته‌وخۆ باس بكردایه‌، ئـه‌وا "حیكمـه‌تی تـه‌كلیف" نـه‌ده‌ما و، ئـه‌و شـتانه‌ش ده‌بـوون بـه‌ ئاسایی و به‌دیـهی، وه‌ك ئـه‌وه‌ی بـه‌ ئاشـكرا لـه‌ ئاسماندا به‌ ئه‌ستێره‌كان "لا إلـه إلا الله" بنووسرایه‌! چونكـه‌ ئـه‌و كاتـه‌ خـه‌ڵكی، بیانویستایه‌ و نه‌یانویسـتایه‌، ناچـار ده‌بـوون ته‌سـدیقی بكـــه‌ن! دیــاره‌ ئــه‌و كاتــه‌ش هیــچ پێشــبڕكێ و تاقیكردنه‌وه‌یه‌ك و ئنجا هیـچ لێـك جیاكردنه‌وه‌یـه‌ك لـه‌ گـۆڕێدا نـه‌ده‌بوو، پاشـان ئـه‌و ڕۆحـه‌ نزمانه‌ی كه‌ چه‌شنی خه‌ڵووزن، له‌ ڕۆحیانه‌ته‌ به‌نرخه‌ ئه‌ڵماس‌ئاساكان جیا نه‌ده‌كرانه‌وه‌[1] !

---

(١) ئه‌و كاته‌ ئه‌بووجه‌هلـی له‌عنه‌تی و ئه‌بوو به‌كـری صیددیـق – خـوای لـێ ڕازی بێـت – لـه‌ یـه‌ك ئاسـتدا ده‌رده‌كه‌وتن و ته‌كلیف له‌ گۆڕێدا نه‌ده‌ما. (دانه‌ر)

**بە پوختی:**

قورئانی پیرۆز دانایە، هەموو شتێك پلە و پایەی خۆی بۆ دادەنێت و، لـە پێش سێ سەد و پەنجا سـاڵ و لە پشتی پەردەی غەیبەوە ئەو بەروبوومانەی پێشـکەوتنی شـارستانێتیی مرۆڤی – کە بە تاریکایی ئایندە داپۆشرابوون – زۆر باشتر و ڕوونتر بینیوە لـەوەی کە ئێستا خۆمان دەیـانبینین. کەواتـە قورئـانی پـیرۆز گوفتـاری کـەسـێکە کـە لـە یـەك کـاتدا سـەرجەم زەمانەکان و کاروبار و شتانی ناویشیان پێکەوە دەبینێت.

ئەمـە بریسـکانەوەی ئیعجـازی قورئـان بـوو، کـە بـە ڕووی موعجـیزاتی پێغەمبەرانـەوە دەدرەوشایەوە.

اللهمَ فَهِّمْنا أسرار القرآن ووفقنا لخدمته في كل آن وزمان.

**﴿سُبْحانكَ لا عِلْمَ لنا إلاّ ما علَّمْتَنا إنّكَ أنتَ العليم الحكيم﴾.**

**﴿ربَّنا لا تُؤاخِذْنا إنْ نسينا أو أخطأْنا﴾.**

اللهم صلِّ وسلِّم وبارك وكرِّم علـى سـيدنا ومولانـا محمد، عبدك ونبيك ورسولك النبي الأمـي وعلـى آلـه وأصحابه وأزواجه وذرياته، وعلـى النبيـين والمرسـلين والملائكة المقربين والأولياء والصالحين، أفضل صلاة وأزكـى سلام وأنمى بركات، بعدد سور القـرآن وآياتـه وحروفـه وكلماته ومعانيه وإشاراته ورموزه ودلالاتـه، واغفـر لنـا وارحـمنا والطف بنا يا إلـهنا يا خالقنا بكل صلاة منـها، برحـمتك يا أرحم الراحـمين.

والحمد لله رب العالمين.

آمين.

# وتەی بیست و یەکەم

## مەقامی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إِنَّ الصَّلاةَ كانَتْ عَلى الْمُؤْمِنِين كِتاباً مَوْقوتاً﴾ (النساء:١٠٣)

ڕۆژێکیان یەکێك، کە لە تەمەن و بەژنوبالاّ و پلەدا لە خۆم گەورەتر بوو، پێی وتم:

(بەجێهێنانی نوێژ شتێکی جوان و شیرینە، بەلاّم دووپات بوونەوەی لە پێنج کاتدا و نە ماوەی یەك ڕۆژدا، گەلێ زۆرە. ئەم زۆرییەش مرۆڤ بێزار دەکات)!

پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم قسەیەدا تێپەڕی، گوێم لێ بوو نەفسی خۆیشم هەمان قسەی دەکردەوە! منیش کە بە وردی سەرنجم لە نەفسی خۆم دا، بۆم دەرکەوت ئەم نەفسە لە ڕێی تەمبەڵییەوە هەمان دەرسی لە شەیتان وەرگرتووە. ئەو کاتە زانیم کە ئەو پیاوەی باسم کرد، بە ناوی هەموو نەفسێکی ئەمارەوە ئەو قسەیەی کرد، یان بەبێ ویستی خۆی پێیدرکێنرا!

کە ئەمەم بۆ دەرکەوت (لەبەر خۆمەوە) وتم:

مادەم نەفسی خۆیشم بەدخوازە، ئەوا دەبێ لە خۆمەوە دەست پێ بکەم. چونکە هەرکەسێ نەفسی خۆی بۆ چار نەکرێت، دیارە هی خەڵکی تری هەرگیز پێ چار ناکرێت! لەبەر ئەوە، ڕووم لە "نەفس"ی خۆم کرد و پێم وت:

نەفسەکەم! وا دیارە تۆ نوقمی نەفامییەکی ئاڵۆز بوویت و، لەسەر پێخەفی تەمبەڵی خەوی بێئاگاییت لێ کەوتووە. جا لە بەرامبەر ئەو قسەیەی کە دەرتبڕی، ئەم پێنج "بێدارکردنەوە"یەم لێ ببیستە و وەریان بگرە:

**❑ بێدارکردنەوەی یەکەم:**

**ئەی نەفسی بەدبەختم!**

**ئایا تەمەنت هەمیشەیییە؟**

ئایا هیچ پەیمانێکی ڕاست و بێ گومانت دراوەتێ کە تا ساڵێکی تر، تەنانەت تا سبەینێ بمێنیت و لەم دنیایە کۆچ نەکەیت؟

دیارە هیچ کام لەمانە نی‌یە. کەواتە یەك شت هەیە لە نوێژ کردن بێزاری کردوویت، کە ئەوەیە: بە وەهمی خۆت پێت وایە هەرگیز نامریت و لە دنیادا هەمیشەیی دەبیت. لەم ڕێگایەشەوە وات لێ هاتووە ناز بکەیت و پێت وابێت کە لە دنیادا بۆ خۆشی و ڕابواردن هەر دەمێنیتەوە.

جا ئەگەر لەوە تێ بگەیت کە تەمەنت یەکجار کورتە و لە ناکاودا بێهوودە دەڕوات و لەدەستت دەردەچێ، ئەوا بە جوانی بۆت دەردەکەوێت کە بەکارهێنانی بەشێك لەو بیست و چوار بەشەی (ژیانی ڕۆژانەت) لە بەجێهێنانی خزمەتگوزاری‌یەکی جوان و فەرمانبەری‌یەکی شیرین و پشوودەردا، کە لە هەمان کاتیشدا هۆی میهرەبانی و ژیانێکی پڕ لە بەختەوەریی هەمیشەیی‌یە، هەرگیز نابێت بە مایەی بێزاری، بەڵکو ئەو کاتە نوێژکردن دەبێت بەهۆی وروژاندنی شەوق و زەوقێکی جوان و بەرز و ڕاستەقینە لە مرۆڤدا.

**☐ بێدارکردنەوەی دووهەم:**

ئەی نەفسە چڵێسەکەم!

تۆ هەموو ڕۆژێك نان دەخۆیت و، ئاو دەخۆیتەوە و، هەناسە دەدەیت.. ئایا ئەم دووپات بوونەوە ڕۆژانەیە نابێت بە مایەی بێزاری؟

بێ گومان نەخێر.. چونکە دووپات بوونەوەی شتی پێویست نەك هەر نابێت بە مایەی بێزاری، بەڵکو چێژ و لەزەتیشی تازە دەکاتەوە.

لەبەر ئەوە، ئەو نوێژکردنەی کە خۆراکە بۆ "دڵ"م و، ئاوی ژیانە بۆ "گیان"م و، سروەی فێنکی و حەوانەوە بەو لایەنە ناسك و پەنهانەم دەبەخشێت کە پێی دەوترێ: "السّر الإنساني" .. ئەو نوێژە هەرگیزاوهەرگیز زویر و بێزارم ناکات.

بەڵێ، ئەو "دڵ"ەی کە گیرۆدەی ئازار و پەژارەیەکی بێ سنوور بێت و کەوتبێتە داوی چەندین ئاوات و ئازاری بێ کۆتایی‌یەوە، ئەو "دڵ"ە، هێز و خۆراکی خۆی تەنها لەوەدا دەبینێتەوە کە بەوپەڕی توانایەوە بە دەستی نزا و لالانەوە لە دەرگانەی ئەو خواوەندە میهرەبانە بدات کە دەستەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا.

"گیان"یش کە لەگەڵ زۆربەی ئەو بوونەوەرانەی بە پەلە دێن و دەڕۆن، پەیوەندیی هەیە، هەرگیز ئاوی ژیان نانۆشێت و تامی ناکات، تەنها بەوە نەبێت کە لە ڕێی نوێژەوە ڕوو بکاتە سەرچاوەی میهرەبانیی ئەو خوایەی کە خۆشەویستە و پەرستراوی هەمیشەیی‌یە.

ئەو لایەنە نیان و ناسك و هەستیار و نەبینراوەش کە پێی‌دەوترێ: "السّر الإنساني" و بریتی‌یە لە شتێکی نوورانی و سەر بە پەروەردگار و بۆ هەتاهەتایی بەدی هێنراوە و بە سروشتیش حەزی لە ژیانێکی هەمیشەیی‌یە و، ئاوێنەیەکی ڕەنگدەرەوەی درەوشانەوەکانی نووری زاتی گەورەی کردگارە.. ئەم لایەنە ناسکەی کە ئەم سیفەتانەی هەیە، لە نێوان

سەختی و پاڵەپەستۆی ئەم بارە دژوار و تەنگ و تاریکانەی ژیانی دنیادا، پێویستی‌یەکی زۆری بە هەناسە و پشوودان هەیە. خۆ ئەگەر لە دەروازەی نوێژەوە نەبێت، هەرگیز ئەو هەناسە و پشوودانەی دەستگیر نابێت.

❑ **بێدارکردنەوەی سێهەم:**

ئەی نەفسی بێ ئارامم!

تۆ ئێستا لە "ئەمڕۆ"دا و لە یادکردنەوەی ماندووبوونی ئەو پەرستشانەت کە لە ڕۆژانی "ڕابوردوو"دا بەجێت هێناون و لە دەست ئەرکی ئەو نوێژانەش کە پێشتر کردووتن، بێ ئارامی و شڵەژانی خۆت دەردەبڕیت.. پاشان وا "ئەمڕۆ"ش کە بیر لە دەست ئەرکی پەرستش و خزمەتگوزاری‌یەکانی نوێژکردن و ئازار و بەڵا و گیروگرفتەکانی ڕۆژانی "داهاتوو" دەکەیتەوە، ئۆقرەت لەبەر دەبڕێ و بێ ئارامی دەنوێنیت! جا ئایا هەر کەسێك خاوەنی تۆزقاڵێك هۆش و ژیری بێت کاری وا دەکات؟ یان هەڵوێستی وای لێ دەوەشێتەوە؟

تۆ لەم ڕەفتارەتدا وەك ئەو سەرکردە نەزانە وایت کە هێزێکی گەورەی سوپاکەی ئاراستەی دەستەڕاستی سوپای دوژمن کرد، لەو کاتەدا کە ئەو بەشەی سوپای دوژمن لەوێ نەمابوون و هاتبوونە ڕیزی سوپاکەی ئەمەوە و بووبوونە پاڵپشتی! ئنجا بەشەکەی تری هێزەکەی بۆ سەر دەستەچەپی دوژمن نارد، لە کاتێکدا کە هیچ سەربازێکی ئەوانی تێد نەمابوو! دوژمنیش ئەم هەل و دەرفەتەی قۆزتەوە و، هێرشێکی چاپوکانەی هێنایە سەر ناوجەرگەی سوپاکەی ئەم پادشایە و، خۆی و سوپای - بە تەواوی - تەفروتوونا کرد.

بەڵێ، تۆ لەم سەرکردە هەڵەشەیە دەچیت! چونکە هەموو ماندوویی و ئازارەکانی ژیانی ڕابوردوو، ڕۆشتن و بەسەرچوون. واتە ئازارەکانی ڕۆژانی ڕابوردووت نەماون، بەڵام لەزەت و خۆشی‌یەکانی هەر ماون و پاشان ماندووبوون و ئەرکەکانیشی بوون بە پاداشت و بۆت پاشەکەوت کراون. کەواتە لە ڕاستی‌دا ئەو ئازارانەی ڕابوردوو، بێ‌تاقەتی و بێ‌ئارامی بەرهەم ناهێنن، بەڵکو شەوق و شادمانی‌یەکی نوێ و هەوڵ و کۆششێکی هەمیشەییت پێ دەبەخشن و هەڵت دەنێن کە پتر هەنگاو بەرەو پێش بنێیت.

بیرکردنەوەش لە ڕۆژانی داهاتوو - کە هێشتا نەهاتوون - لە ڕاستی‌دا جۆرە نەفامی و نەزانی‌یەکی تایبەتی‌یە و، وەك ئەوە وایە: لە ترسی برسێتی و تینوێتی‌یەك کە لەوانەیە لە ڕۆژانی داهاتوودا بێنە ڕێت، هەر لە ئێستاوە دەست بە هاوار و گریان بکەیت!

جا مادەم ڕاستی وایە، ئەوا تۆش - گەر خاوەنی تۆزقاڵێك هۆش و ژیرییت - بیر لە پەرستشی "ئەمڕۆ"ت بکەرەوە.. بەڵێ، هەر تەنها ئەمڕۆ و بەس. بە خۆت بڵێ: "وا سەعاتێکی ئەمڕۆم لە ئەرکێکی گرنگی بەلەزەت و جواندا.. لە خزمەتگوزاری‌یەکی بەرزی بەپیت و

پاداشتی کەم ئەرکدا بەسەر دەبەم". کە ئەنجامیشت دا، هەست بە نەمانی ئازار و کەمتەرخەمی‌یەکانت دەکەیت و دەبینیت هیممەت و چالاکی‌یەکی خۆش و بەتامیان بۆ بەجێ هێشتوویت.

دەسا ئەی نەفسی بێ ئارامم!

بزانە کە سێ جۆر ئارامگرتنت لە بەردەمدایە و لێیان بەرپرسیاریت:

**یەکەم**: ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی و خواپەرستی.

**دووهەم**: ئارامگرتن لەسەر خۆپاراستن لە تاوانکاری و یاخی بوون.

**سێهەم**: ئارامگرتن لە کاتی بەڵا و موسیبەتدا.

جا مادەم ئەم سێ جۆرە ئارامگرتنەت لە ئەستۆدایە و، تۆش گەر مرۆڤێکی زیرەك و هۆشیاریت، ئەوا فەرموو لەو ڕاستی‌یە بەرزەی کە لە نموونەی سەرکردەکەدا هەیە، پەند و ئامۆژگاری وەربگرە و، بەوپەڕی جوامێری و هیممەت و غیرەتەوە هانا بۆ لای خوای گەورە بەە و بڵێ: "یا صبور"! پاشان هەر سێ جۆرەکانی ئارامگرتن بخەرە ئەستۆی خۆت و، پشت بەو هێزی ئارامگرتنە ببەستە کە خواوەند لە تۆدا ديناوە. چونکە هەر تەنها ئەو هێزە سەروزیادی بەرەنگاربوونەوەی سەرجەمی ئەو ئازار و ئەرك و گیروگرفتە زۆرانەن کە لە ژیاندا دێنە ڕێت، بە مەرجێ ئەم هێزەت بەم لا و بەو لا و لە شتی لاوەکی‌دا بڵاو نەکەیتەوە و لە دەستی خۆتی دەرنەکەیت!

☐ **بێدارکردنەوەی چوارەم:**

ئەی نەفسی سەرکەشم!

ئایا ئەم پەرستشە ئەرکێکی بێ ئەنجام و بێ مەبەستە؟ یان ئایا پاداشتەکەی بە کەم دەزانیت تا بێزاریی لە دەست دەربڕیت؟

خۆ ئەگەر هەرکام لە ئێمە بەڵێنی پارە و پوولێکی پێ بدرێت، یان بۆ کار کردن زۆری لێ بکرێت، هەر لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارە - بە بێ بێزاری دەربڕین - بۆ کار کردن لێدەبڕێت و خۆی ماندوو دەکات..

ئایا ئەو نوێژەی کە لەم میوانخانە کاتی‌یەی دنیادا ئارامی بە "دڵ"ی کۆڵەواری مرۆڤ دەبەخشێت و دەبێت بە توێشووی ئەو دڵە.. ئەو نوێژەی کە خۆراك و ڕووناکیی ئەو مەنزڵەیە کە چار نی‌یە دەبێ بڕۆیتە ناویەوە "کە گۆڕەکەتە".. ئەو نوێژەی کە بۆت دەبێت بە "تەبرییە" و پەیمان لەو دادگایەدا کە بێ هیچ گومانێك تیایدا حەشر دەکرێیت.. ئەو نوێژەی کە لەسەر پردی سیراتدا - کە دەبێ بەسەریدا تێپەڕیت - بۆت دەبێت بە بوراق و ڕووناکی، تاکو بە ئاسانی بی‌بڕیت.. ئەو نوێژەی کە ئەم هەموو بەرهەمانەی هەیە، تۆ هێشتا

بە شتێکی بێ‌ئەنجامی دەزانیت؟ یان پاداشتەکەی بە کەم لەقەڵەم دەدەیت؟

خۆ ئەگەر کەسێك بەڵێنی "سەد" لیرەت بداتێ، ئەوا بێ هیچ بێزاربوونێك "سەد" ڕۆژی ڕەبەق کاری بۆ دەکەیت و پشت بە بەڵێنەکەی دەبەستیت، لەکاتێکدا کە دەشزانیت لەوانەیە بەڵێنەکەی نەباتەسەر..

ئایا هەڵوێستت بەرامبەر بەو کەسە چی‌یە کە بەڵێنی پێ داویت و دڵنیاشی لەوەی کە بەڵێنەکەی دەباتەسەر؟ ئەوەتا هەر بۆ خۆت دەزانیت کە نەبردنەسەری بەڵێن لای ئەو کارێکی مەحاڵە. نابینیت وادەی پاداشتی بەهەشت و بەڵێنی دیاری‌یەکی گەلێ مەزنی پێ داویت، کە بەختەوەریی هەمیشەیی‌یە، لە بەرامبەر بەجێهێنانی ئەرك و فەرمانبەری‌یەکی ئاسان لە ماوەیەکی کەم و کورتی تەمەندا؟

ئایا بیر لەوە ناکەیتەوە کە ئەگەر ئەم خزمەتگوزاری و فەرمانبەری‌یە کەم و ئاسانە ئەنجام نەدەیت.. یان ئەنجامی بدەیت بەڵام بە بێ هیچ حەز و تاسە و شەوقێك و بە چەشنێکی پچڕ پچڕ بەجێی بهێنیت.. ئایا ئەم ڕەفتارەت ئەوە ناگەیەنێت کە تۆ گاڵتە بە دیاری‌یەکەی ئەو دەکەیت و لە بەڵێنەکەی‌دا تۆمەتباری دەکەیت؟ ئایا ئەو کاتە - بۆ ئەوەی لەسەر ئەو هەڵەیەت سزا بدرێیت - شایانی ئازارێکی سەخت نابیت؟

ئایا ئەمە هیممەتت نابزوێنێت کە ئەم فەرمانبەری‌یە ئاسانە لە ترسی سزای بەندیخانەی هەمیشەیی دۆزەخ بەجێ‌بهێنیت؟ لە کاتێکدا کە لە ترسی ئەشکەنجەی بەندیخانەی دنیا چەندەها کاری قورسی بە ئەشکەنجە و ئازار ئەنجام دەدەیت، کە دەشزانیت سزای بەندیخانەی دنیا هەرگیز لە هی بەندیخانەی هەمیشەیی دۆزەخ ناچێت و هاوتای یەکتری نین؟

□ **بێدارکردنەوەی پێنجەم:**

ئەی نەفسی دنیاپەرستم! ئایا ئەم تەمبەڵی و کەمتەرخەمی‌یەت لە نوێژ و پەرستشدا هی سەرقاڵی و کاروباری دنیاکەتە؟ یان بەهۆی بێ‌کاتی و خەفەتی دەرد و ئازاری ژیانەوەیە کە بەو جۆرە سەرت ناپەرژێتە سەریان؟

گەلێ سەیرە! خۆ تۆ تەنها بۆ دنیا دروست نەکراویت تا تەنها سەرقاڵی دنیا بیت!

باش بزانە کە هەرچەندە تۆ بە سروشت لە هەموو زیندەوەرانی دنیا باڵاتری، بەڵام هەرگیز بە ئەندازەی بچووکترین چۆلەکە توانای بەدەستهێنانی پێداویستی‌یەکانی ژیانی دنیات نی‌یە..

ئەدی بۆچی لەم بەراوردەوە تێ‌ناگەیت لەوەی کە تۆ وەك ئاژەڵ و زیندەوەرانی تر نیت تاکو ئەرکی سەرەکیی ژیانت بریتی بێت لە بایەخدان بە ژیانی دنیا؟

تۆ (وەك مرۆڤێکی ڕاستەقینە) کارمەندی و ئەرکی سەرەکیت لە ژیانی دنیادا بریتی‌یە لە هەوڵدانی بێ وچان بۆ ژیانێکی هەمیشەیی. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی ئەو سەرقاڵی

کاروبارە دنیایی‌یانەی کە باسیان دەکەیت هیچ پەیوەندی‌یەکیان بە تۆوە نی‌یە و بە زۆر خۆتیان تێ هەڵدەقورتێنیت، بەمەش کاتی هەرە بەنرخی خۆت بە شتی بێ‌هوودە و بێ سوودەوە لە دەست دەردەکەیت. وەك ئەوەی کە دەتەوێ بزانیت ژمارەی مریشك لە ئەمریکادا چەندە و، ئەڵقەکانی دەوری هەسارەی کەیوان(زُحَل) لە چ جۆرێکن!! وەك بتەوێت لەم ڕێیەوە شتێك لە بارەی "ئامار" و "گەردوونناسی"یەوە فێر ببیت! ئیتر بەم جۆرە ئەوەی پێویست و گرنگە وازی لێ دەهێنیت و، سەرگەرمی کاری وا بێ‌هوودە دەبیت وەك پێت وابێت هەزاران ساڵ لە دنیادا دەژییت و تەمەن بەسەر دەبەیت!

خۆ ئەگەر دەشڵێیت: ئەو شتەی لە پەرستش دوورم دەخاتەوە و ساردم دەکاتەوە، ئەم شتە کەم نرخانە نین، بەڵکو چەند کاروبارێکی ئەوتۆن کە بۆ ژیانی دنیا پێویستن ئەنجامیان بدەم.. گەر وا دەڵێیت، ئەوا گوێ ڕابگرە با ئەم نموونەیەت بۆ باس بکەم:

ئەگەر کرێی ڕۆژانەی کەسێك "سەد فلس" بێت و، یەکێکی تر بێت و پێی بڵێت: (وەرە بۆ ماوەی (دە) خولەك ئەم جێگایە هەڵبکەنە، چونکە یەك دانە گەوهەر یان بەردێکی گرانبەهای – سەد لیرەیی – تێدایە و بۆ خۆتی دەربهێنە).. ئەگەر ئەم کرێکارە بەهانە بهێنێتەوە و بڵێت: (نەخێر.. کاری وا ناکەم، چونکە ڕۆژانەکەم کەم دەکاتەوە)!.. چەندە کارێکی شێتانە دەکات و چ بەهانەیەکی بێ نرخ دەهێنێتەوە؟!

تۆش وەکو ئەم کرێکارە وایت! چونکە ئەگەر واز لە نوێژکردن بهێنیت، ئەوا هەرچی بەروبوومی ئەو کۆششانەی کە لەم ڕەز و باخ و بێستانەتدا کردووتن، تەنها لەوەدا دەبێت کە دەرامەتێکی کەم نرخی دنیاییت تێدا دەست دەکەوێت و، لە خێر و بەرەکەتیشی بێ بەش دەبیت. بەڵام ئەگەر کاتەکانی پشوودان و حەوانەوەت – کە لە نێوان کاتەکانی کار کردندان – لە نوێژ کردندا بەسەر بەریت، کە دەبێتە مایەی پشوودانی دەروون و حەوانەوەی گیان، ئەوا دوو کانگا و سەرچاوەی مەعنەوی و هەمیشەییت دەست دەکەوێت و بۆت دەخرێنە سەر دەرامەت و توێشووەکانی ئەودنیا و دەرامەتە پیرۆزەکانی ئەم دنیاشت.

ئەو دوو کانگا و سەرچاوە مەعنەوی‌یانەش ئەمانەن:

*کانگای یەکەم:*

ئەو کاتە بەهۆی نییەتی پاك و پڕ لە ئیخلاس و نیازی بێ گەردتەوە، بەشی خۆت لە تەسبیحاتی ئەو گوڵ و بەروبووم و ڕووەکانەی کە لە باخ و ڕەزەکەتدا بەرهەمت هێناون، وەردەگریت[1].

---

(١) لێرەدا ڕووی دەمی قسە لە باخەوانێکی خەڵکی (بارلا)یە و وەڵامی پرسیارێکی ئەوە. (دانەر)

*كانگای دووهه‌م:*

ئه‌وه‌یه‌ كه‌ هه‌ر كه‌سێك - چ دز بێ و چ كرپار، ته‌نانه‌ت ئاژه‌ڵیش - هه‌ر شتێك بەروبوومی باخ و ڕه‌زه‌كه‌ت بخوات، وه‌ك خێرێكی هه‌میشه‌یی و به‌رده‌وام لای خوای گه‌ بۆت ده‌نووسرێت، به‌ مه‌رجێ خۆت به‌ وه‌كیل و فه‌رمانبه‌رێكی دابه‌شكردنی ماڵی حه دابنێیت له‌م كاره‌دا. واته‌: به‌و مه‌رجه‌ی كه‌ به‌ ناوی ڕۆژیده‌ری ڕاسته‌قینه‌ و له‌ پێنا ڕه‌زامه‌ندیی ئه‌ودا ئه‌م كارانه‌ ئه‌نجام بده‌یت.

ئێستا سه‌رنج له‌و كه‌سه‌ بده‌ كه‌ وازی له‌ نوێژكردن هێناوه‌ و، بزانه‌ چ زیانێكی گه‌ ده‌كات و چه‌نده‌ له‌و سامانه‌ زۆره‌ و چۆن له‌و دوو كانگا و سه‌رچاوه‌ به‌پیت و هه‌میشه‌یی بێ به‌شه‌، كه‌ هه‌ردهم هێز و شه‌وقی مه‌عنه‌وی بۆ كار و كۆشش له‌ مرۆڤدا دروست ده‌كه‌ سه‌رنجی بده‌ و بزانه‌ كاتێ كه‌ ده‌گاته‌ ته‌مه‌نی پیری، چۆن بێزار ده‌بێت و له‌به‌ر خۆیه‌وه‌ به‌ حه ده‌ڵێت : (بۆ كێی بكه‌م؟ خۆ ده‌بێ سبه‌ینێ ئه‌م دنیایه‌ به‌جێبهێڵم! كه‌واته‌ بۆچی خۆم مه بكه‌م)؟ به‌م شێوه‌یه‌ خۆی ده‌هاوێته‌ ناو باوه‌شی ته‌مبه‌ڵی و كه‌مته‌رخه‌می‌یه‌وه‌.

به‌ڵام مرۆڤی یه‌كه‌م وا ناڵێت، به‌ڵكو ده‌ڵێت : (هه‌رده‌م له‌گه‌ڵ كرده‌وه‌كانمدا، كه‌ له‌دوای ڕۆژ له‌ په‌ره‌سه‌ندن و زیادبووندان، بۆ ئیش و كاری حه‌ڵاڵ تێده‌كۆشم، تا ڕووناكیی زیاتر به‌ره‌و ئاخیره‌ت به‌رێ بكه‌م).

**به‌ كورتی:**

ئه‌ی نه‌فسه‌كه‌م!

بزانه‌ كه‌ "دوێنێ" ڕۆشت و له‌ده‌ست ده‌رچوو.. "سبه‌ینێ"ش هێشتا نه‌هاتووه‌. هیچ به‌ڵێن و په‌یمانێكیشت نه‌دراوه‌تێ كه‌ تۆ "سبه‌ینێ"ت هه‌یه‌ و ده‌مێنیت تا بیبینیت. كه‌واته‌ ته "ئه‌مڕۆ" به‌ ته‌مه‌نی ڕاسته‌قینه‌ی خۆت بزانه‌. كه‌مترین شتێكیش كه‌ تۆ له‌مڕۆدا بتوانیت بیخه ناو سندووقی پاشه‌كه‌وت كردنی دواڕۆژته‌وه‌، ته‌نها یه‌ك سه‌عاته‌ كه‌ له‌ مزگه‌وتدا یان نه به‌رماڵ به‌سه‌ری به‌ریت، تاكو دواڕۆژی ڕاسته‌قینه‌ و هه‌میشه‌یی خۆتی پێ ده‌سته‌به‌ر بكه‌یت

ئه‌وه‌ش بزانه‌ كه‌ هه‌موو ڕۆژێكی نوێ له‌ ژیاندا ده‌رگایه‌كه‌ ڕووه‌و جیهانێكی نوێ - تۆ و هه‌موو كه‌سێكی تر - ده‌خرێته‌ سه‌رپشت. جا ئه‌گه‌ر له‌و ڕۆژه‌دا نوێژه‌كانت نه‌كه‌یت ئه‌وا كاتێ ئه‌و ڕۆژه‌ كۆتایی پێ دێت، به‌ تاریكی و سكاڵا و خه‌فه‌تباری‌یه‌وه‌ به‌ره‌و جیه غه‌یب كۆچ ده‌كات و، سبه‌ینێش له‌ دواڕۆژدا شایه‌تیت له‌سه‌ر ده‌دات.

هه‌ر كام له‌ ئێمه‌ جیهانێكی تایبه‌تیمان له‌ نێوان جیهانی گشتی‌دا هه‌یه‌، جۆری ئه‌و جیه تایبه‌تی‌یه‌ی هه‌ر كامێكیشمان شوێنی دڵ و كرده‌وه‌كانمان ده‌كه‌وێت. (واته‌: ئه كرده‌وه‌كانمان چۆن بن، ئه‌و جیهانه‌ش به‌و جۆره‌ ڕه‌نگ ده‌داته‌وه‌).. ئه‌و جیهانه‌ تایبه‌تی چه‌شنی "ئاوێنه‌"یه‌، ڕه‌نگ و شێوه‌ی شتان وه‌ك خۆیان ده‌رده‌خات. جا ئه‌گه‌ر ئاوێنه

ڕەش و تاریك بێت، وێنەکان ڕەش دەردەخات و، گەر پاك و خـاوێنیش بێـت ئـەوا بـە ڕوونـی پیشانیان دەدات. دەنا وێنـەکان ناشـیرین دەکـات و بچووکـترین شـت وەك گـەورەترین شـت دەردەخات.

تۆش - ئەی نەفسـەکەم! - تەنـها لـە ڕێـی دڵ و عـەقڵ و کردەوەکانتـەوە و، بەپێی نیـاز و ویست و ئارەزووی خۆت دەتوانیت ئەو جیهانە تایبەتی‌یەت وا لـێ بکەیت کە یـان شـایەتیت بۆ بدات لەسەر کردەوەی چاك، یان شایەتیت لەسەر کردەوەی خراپ لـێ بدات.

بـەم جـۆرە، ئەگـەر نوێژەکـانت بـەجێ هێنـا و ئاراسـتەی خواوەنـدی "شـکۆمەند" و بەدیهێنەری خۆت کردن، ئەوا یەکسەر ئەو جیهانەی خـۆت ڕووناك دەبێتەوە. وەك بڵێـی بـە "نییەت"ی نوێژەکەت کلیلی دەرگای ڕووناکیت بە دەستەوە گرتـووە و ئـەو دەرگایـەت پـێ کردووەتـەوە و، چـرای نوێژەکـەت دەوروبـەری تـۆی ڕوونـاك کردووەتـەوە و تـاریکیی تێـدا نەهێشتووە. ئیـتر ئـەو کاتـە هـەرچی دڵتـەنگی و خەفـەت لـە دنیـا تایبەتی‌یەکـەی دەوروبـەرتدا هەن، هیچیان نامێنن و، هەست دەکەیت و بۆ خـۆت دەبینیـت کـە جیهانەکـەت لـە ڕاستی‌دا بریتی‌یە لە: ڕێسا(نظام)یەکی سەرانسەر دانایی و، نووسراوێکی پڕاوپڕ لە واتای ئەوتۆ کـە بـە قەڵەمی توانستی پەروەردگار نووسراوەتەوە. ئنجا لەمەوە یەکێك لە نوورەکانی ئایەتی: ﴿**اللهُ نورُ السَّمواتِ والأرضِ**﴾ (النور:٣٥) دەڕواتە نـاو دڵتـەوە و، جیـهانی ئـەو ڕۆژەت بـۆ ڕوونـاك دەکاتەوە. ئنجا لە خزمەت خواوەندیشدا شایەتیی ئەوەت بۆ دەدات کە ئـەو ڕۆژەت ڕوونـاك بووە.

ئێستاش براکەم!

هـەرگیز نـەڵێیت: (نوێـژی مـن لـەکوێ و، حەقیقـەتی ئـەم نوێـژەی تـۆ باسـی دەکـەیت لەکوێ)؟ نەخێر هەرگیز وانەڵێیت. چونکـە هـەروەك ناوکـە خورمایـەك سـەرجەم سیفەت و ئـەدگارەکانی درەختێکـی خورمـای مـەزنی تێدایـە، مەگـەر جیـاوازی تەنـها لـە گـەورە و بچووکی و کورتـی و درێژی‌دا ببێـت، هـەر بـەو جۆرەش نوێژی عەوامـەکانی وەك مـن و تـۆ بەشێکی لەو نوورە و نهێنی‌یەکی لـە نهێنی‌یەکانی ئـەو حەقیقەتـە تێدایـە، وەك حەقیقـەتی ئـەو نوورەی کە لە نوێژی هەر وەلی‌یەکدا هەیە، با ئەو کەسە خۆیشـی هەسـتی پـێ نـەکات! دیـارە پلـەکانی ڕوونـاکیی نوێـژ، بـە چەشـنی پلـەکانی نێـوان ناوکـە خورمـا و درەختەکـەی، جیاوازی‌یان لە نێواندایە. جا هەرچەند پلەکانی نوێژ گەلـێ زیاترن، بەڵام هەموو پلەیـەك لـەو پلانە بناغەیەکی لەو ڕاستی‌یە نوورانی‌یە تێدایە.

اللهمَّ صَلِّ وسلم على مَنْ قال: "الصلاةُ عمادُ الدين" وعلى آله وصحبه أجمعين.

# مەقامی دووهەمی

## وتەی بیست و یەکەم

### ئەم مەقامە پێنج مەڵهەمی تێدایە بۆ سارێژ کردنی پێنج برینی "دڵ"

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿وَقُلْ رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ۞ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ﴾

(المؤمنون:٩٧-٩٨

ئەی ئەو کەسەی تووشی دەردی وەسوەسە بووە!

ئایا دەزانیت ئەم وەسوەسەیەی تووشی بوویت لە چی دەچێت؟

ئەم وەسوەسەیەی تۆ، وەك موسیبەتێك وایە، چونکە لە پێشدا بە بچووکی دەست پێ دەکات، پاشان وردە وردە و بە گوێرەی بایەخ پێدان و بە گرنگ زانینی، گەورە دەبێت. بە پێچەوانەشەوە ئەگەر گوێی پێ نەدرێت، نامێنێت! واتە هەتا بە گەورەی بزانیت ئەو گەورە دەبێت و، تا بە بچووکیشی بزانیت بچووك دەبێتەوە.. ئەگەر لێی بترسیت ئەوا بە دەردێ دەتتلێنێتەوە و، گەر لێشی نەترسیت دەمکوت و بێدەنگ دەبێت!

جا ئەگەر تۆش حەقیقەتی وەسوەسە نەزانیت، ئەوا درێژە دەکێشێت و جێگیر دەبێت بەڵام ئەگەر بیزانیت و بڕۆیتە بنج و بناوانیەوە، ئەوا لەناو دەچێت و نامێنێت.

مادەم وەسوەسە بەو جۆرەیە کە بۆمان دەرکەوت، ئەوا لێرەدا پێنج ڕوو لەو ڕووە زۆر لەژمارەبەدەرانەی وەسوەسەت بۆ ڕوون دەکەمەوە، بەڵکو - بە یارمەتیی خوای گەورە - ئەم باسکردنە ببێت بە شیفایەکی سارێژکار بۆ دەروونی هەردوو لامان، کە ئەمەش لە دەستەڵاتی خوای گەورەدا کارێکی گران نییە. چونکە نەزانین دەبێت بەهۆی کێش کردنی وەسوەسە بەڵام زانین بە پێچەوانەوەیە، پاڵی پێوە دەنێت و دەری دەکات. جا ئەگەر نەتزانی ئەوا نزیت

دەبێتــەوە و ڕووت تێدەکــات، ئەگــەر زانیشــت ئــەوا ئــەو وەسوەســەیە دەڕوات و پشــت هەڵدەکات!

○ **ڕووی یەکەم** (زامی یەکەم):

شـەیتان ئـەو گومانـەی کـە مەبەستیەتی، یەکـەم جـار لـە دەرفـەتێکدا دەیهاوێتـە نـاو دڵـی مرۆڤەوە، پاشان گوێ بۆ دەنگدانەوەی گومانەکە لە ناخی دڵی ئەو مرۆڤەدا ڕادەگرێت.

جا ئەگەر ئەو دڵە گومانەکەی نەگرتـەخۆ و ئینکـاریی کـرد، ئـەوا ئـەو گومانـە دەبێـت بـە "جنێودان"! ئیتر شەیتان چەندین خەیاڵ و ختوورەی ئەوتۆی لە بـەرچاودا دەردەخـات کـە لـە جنێوی ناشـیرین دەچـن و پێچەوانـەی ڕەویـەی پەیوەندیـیەکانی نێـوان خـوا و بــەندەن و بـە جـۆرێك کە ئەو دڵە بێچارەیە دەکەوێتە ژێر نائومێدییەکی قورسەوە و لە تـاوا دەنـاڵێنێت و دەڵێت : "ئای چەندە بەدبەخت و سەر بە موسیبەتم"! پێـی وا دەبێـت کـە لـە دڵـەوە گوناهبـار بووە و چەند تاوانێکی لە بەرامبەر خواوەندی کەریم و پەروەردگاری خۆیەوە ئەنجام داوە.

بەم جۆرە، دەکەوێتە ناو گێژەڵوو کەیەکی گەورەوە و، لە دڵنیـایی بێ بـەش دەبێـت. هـەر لەبـەر ئەوەشـە کـە دەبینیـت بـە پەرۆشـییەکی زۆرتـرەوە هــەوڵ دەدات لــە بێئاگـاییدا پـتر ڕۆبچێت!

*دەرمانی ئەم زامەش، ئەمەیە:*

ئەی تووشبووی بێچارە! بە هیچ جۆرێك مەترسە و هەرگیز مەشڵەژێ! چونکـە ئەوانـەی کە لە بەردەم ئاوێنەی زەینتدا تێپەڕین، هیچیــان جــوێن نـین، تەنـها چــەند وێنـە و خـەیاڵێکن دێن و دەڕۆن. جـا هـەروەك خـەیاڵکردنی "کوفـر" بـە "کوفـر" نـاژمێررێ، هـەر بـەو جـۆرەش خەیاڵکردنی جوێن بە جوێن دانانرێت. چونکە یەکێك لەو شتانەی کە لە "زانستی مـەنتیق"دا بە شتێکی بەڵگەنەویست(بەدیهی) دانراوە، ئەوەیە کە: "خەیاڵکردن بە حوکـم نـاژمێررێت". بەڵام خودی جوێن، نەك خەیاڵکردنی، بێگومان بە حوکم دادەنرێت.

سـەرەڕای ئەمـەش، ئـەو وتـە نـاڕەوا و ناشایسـتانە هــەرگیز لــە قووڵایـی نـاخی دڵتــەوە دەرنەچوون، بەڵگەش ئەوەیە کە دڵت خـۆی لـە داخ و ئـازاری ئـەو وتانـەدا دەتلێتـەوە! دوور نییە لەو لایەنە هاندەرەی شەیتانەوە بێت کە بە "لمة الشیطان" دەناسرێت و لە دەوری دڵدایـە. هەر لەبەر ئەوەشە کە زیانی وەسوەسە تەنها لەوەدایە مرۆڤ لای وابێت زیـانی هەیـە! چونکـە وەسوەسە (خەیاڵی بێ بناغە) وەك (ڕاستی)یەك دەباتە وەهمی مرۆڤەوە! پاشان ئەم مرۆڤە دڵـی خۆی تاوانبار دەکات و، کردارەکانی شـەیتان – کـە دڵـی ئـەم هیـچ پەیوەندیـیەکی پێیانـەوە

نه‌بووه – ده‌خاته ئه‌ستۆی دڵی خۆیه‌وه، ئیتر لای وا ده‌بێت كه ئه‌و چرپه‌چرپ و وه‌سوه‌سانه‌ی شه‌یتان له‌ ختووره‌ی دڵی خۆیه‌تی و، ته‌سه‌ووری چه‌ند زیانێكی وه‌ها ده‌كات كه له ئه‌نجامدا دێنه ڕێی. خۆ دیاره شه‌یتانیش هه‌ر ئه‌وه‌ی ده‌ویست له‌و مرۆڤه ڕوو بدات!

**○ ڕووی دووهه‌م:**

كاتێك كه واتاكان له دڵه‌وه ده‌رده‌چن، به بێ هیچ وێنه و شێوه‌یه‌ك ده‌ڕۆنه ناو خه‌یاڵه‌وه. ئنجا له‌وێ وێنه و شێوه‌كان له‌به‌ر ده‌كه‌ن. خه‌یاڵیش – هه‌ر جاره‌و له‌به‌ر چه‌ند هۆیه‌ك – جۆره وێنه و شێوه‌یه‌كی تایبه‌تی ده‌چنێت و، له ڕێگادا هه‌ر وێنه‌یه‌ك خۆی بایه‌خی پێ بدات. پیشانی ده‌دات. ئیتر هه‌ر واتایه‌ك كه له دڵه‌وه دێت و ده‌گاته ئه‌وێ، یه‌كسه‌ر خه‌یاڵ یه‌كێك له‌و وێنه چنراوانه‌ی خۆی ده‌كاته به‌ر، یان پیای‌دا هه‌ڵده‌واسێت، یان به‌و وێنه چنراوانه‌ی خۆی ئه‌و واتایانه پیس و له‌كه‌دار ده‌كات، یان دایانده‌پۆشێت..

جا ئه‌گه‌ر واتاكانی دڵ ساف و بێ گه‌رد بن و وێنه ته‌نراوه‌كانی خه‌یاڵیش چه‌په‌ڵ بن، ئه‌و هیچ كالآیه‌ك به به‌ریان ناكات، ئه‌وه‌نده نه‌بێ كه ئه‌و وێنه و خه‌یالآنه ده‌ستێك به‌سه‌ر ئه‌و واتایانه‌دا ده‌هێنن، واته "مَسّ"ی ده‌كه‌ن، ئیتر ئا لێره‌دا مرۆڤی تووشبووی وه‌سوه‌سه سه‌ری لێ تێك ده‌چێت و ئه‌م ده‌ست لێ‌خشاندن(مس)ه به له‌به‌ركردن(التَّلَبُّس) یان پێ له‌به‌ركردن(التَّلبیس) تێ‌ده‌گات و، له‌به‌ر خۆیه‌وه هاوار ده‌كات و ده‌ڵێت : "ئای خوایه گیان چه‌نده به‌دبه‌ختم! وا دڵم له‌و هه‌ڵدێرانه‌دا كه‌وت و هه‌ڵنه‌سایه‌وه و، ئه‌م بێ‌نرخی‌یه‌ی نه‌فسیشم ده‌بێت به‌هۆی بێ‌به‌ش بوونم له میهره‌بانیی و به‌زه‌یی خوای گه‌وره‌ی میهره‌بان".

شه‌یتانی له‌عنه‌تیش ده‌رفه‌تێكی زۆر له‌م ژێ(وتر) هه‌ستیاره‌ی ئه‌م كه‌سه ده‌بینێت و، په‌نجه چه‌په‌ڵه‌كانی خۆی به‌سه‌ردا ده‌هێنێت و ده‌بات!

*چاره‌سه‌ر و مه‌لهه‌می سارێژكاری ئه‌م زامه به‌سوێ و قووڵه، ئه‌مه‌ی خواره‌وه‌یه:*

هه‌روه‌ك "نوێژ" پێویستی به پاك و خاوێنی‌یه‌كی ڕواڵه‌تیی له‌ش هه‌یه و، ئیتر پڕبوونی ناوه‌وه‌ی له‌ش له پیس و چه‌په‌ڵی، هیچ زیانێكی تێدا نی‌یه و نوێژه‌كه‌ت به‌تاڵ ناكاته‌وه.. به هه‌مان جۆر، دراوسێ‌یه‌تیی وه‌سوه‌سه چه‌په‌ڵه‌كانیش له‌گه‌ڵ واتا به‌رز و موقه‌دده‌سه‌كاندا، هیچ زیانێك له‌و واتایانه نادات!

بۆ نموونه: كاتی وا ده‌بێت كه بیر له ئایه‌تێكی خوای گه‌وره ده‌كه‌یته‌وه، كه‌چی ئازاری نه‌خۆشی‌یه‌ك له‌و كاته‌دا ده‌تهه‌ژێنێت.. یان ته‌نگاو ده‌بیت و، ئه‌مانه‌ش زۆر بۆ خه‌یاڵت ده‌هێنن. دیاره له‌م كاته‌دا سه‌باره‌ت به حاڵه‌تی یه‌كه‌م خه‌یاڵت بۆ لای ده‌رمان ده‌چێت و له حاڵه‌تی دووهه‌میشدا بۆ لای چوونی سه‌ر ئاو، به‌و جۆره‌ی كه خه‌یاڵه نزمه‌كان تان و پۆی بكه‌ن. ئیتر وێنه و شێوه‌ی ئه‌و خه‌یاڵه نزمانه له ناوه‌ندی ئه‌و بیركردنه‌وه به‌رزانه‌دا تێپه‌ڕ ده‌بن.

تۆیش - کاکی برا! - لێیان گەڕێ با تێپەڕ ببن! چونکە هیچ زیان و مەترسییەکیان تێدا نییە. مەترسیی ڕاستەقینە لەوەدایە کە بیری خۆت بە چڕی ئاراستەی مەترسی لێ کردنیان بکەیت و پێت وا بێت زیانیان هەیە!

**○ ڕووی سێهەم:**

چەند پەیوەندییەکی نادیار لە نێوان شتاندا هەن، تەنانەت لەوانەیە لە نێوان ئەو شتانەشدا کە بیرمان بە لایاندا ناچێت چەند تاڵە موویەك ببێت کە پەیوەندییان لە نێواندا دروست بکات. جا ئەم تاڵە مووە پەیوەندیدەرانە یان لە ڕاستیدا هەن، یان خەیاڵ بە گوێرەی ئەو کارانەی سەرقاڵە پێیانەوە دروستیان دەکات و بەیەکەوە دەیانبەستێتەوە..

هەر ئەمەشە کە هەندێ جار دەبێت بەهۆی ئەوەی لە کاتی بیرکردنەوە لە کاروبارە پیرۆز و موقەددەسەکاندا چەندین خەیاڵی خراپ بە دوای یەکدا بێن و پەیدا ببن. چونکە وەك لە زانیاریی ڕەوانکاری(علم البیان) زانراوە: (ئەو دژایەتییەی کە لە دەرەوەی زەین و خەیاڵدایە دەبێت بەهۆی لەیەك دوورکەوتنەوەی شتانی دژبەیەك، هەر هەمان دژایەتییە کە دەبێت بەهۆی کۆبوونەوە و دراوسێیەتییان لە تەسەوور و خەیاڵدا)! واتە هەر تەنها خەیاڵە کە دوو شتی دژ بە یەك کۆ دەکاتەوە. ئەم جۆرە ختوورانەش کە لەم هۆکارەوە پەیدا دەبن، پێیان دەوترێت: "بیرکێشەکی"(تداعي الافکار).

بۆ نموونە:

لەو کاتەدا کە تۆ بە دڵگەرمی وخشووعەوە لە نوێژدا وتووێژ لەگەڵ پەروەردگاری خۆتدا دەکەیت و بە دڵ ئامادەی حوزووریت و بیر لە واتای ئایەتەکان دەکەیتەوە و ڕووەو قیبلەی پیرۆز ڕاوەستاویت، دەبینیت ئەم بیرکێشەکییە لەم کاتەدا بیرت بۆ لای شتی وەها ڕادەکێشێت کە هیچ پەیوەندییەکی بە تۆوە نییە و بە تەواوی مرۆڤ شەرمەزار دەکات.

جا ئەگەر تۆ - ئەی برای بەڕێزم! - تووشی ئەم بیرکێشەکییە بوویت، ئەوا هیچ پەرۆش مەبە و خەفەتی پێ مەخۆ. بەڵکو هەر کە هەستت پێ کرد یەکسەر بگەڕێرەوە بۆ حاڵەتی سروشتیی خۆت و، دڵت بەم ختوورانەوە سەرگەرم مەکە و مەڵێ: (ئای چەندە تەقسیربار و کەمتەرخەمم)! پاشان بڕۆیت بە دوای هۆکاری ئەمانەدا بگەڕێیت! نەخێر شتی وا مەکە. بەڵکو بۆ ئەوەی ئەم وەسوەسە و پەیوەندییە ڕێبوارانە بەهۆی بیرلێکردنەوە و بایەخ پێدانەوە بەهێز نەبن، ئەوا پێویستە هەر تەنها بەلایاندا گوزەر بکەیت و ئاوڕیان لێ نەدەیتەوە و هیچ بیرێکیان لێ نەکەیتەوە. چونکە تا پتر بایەخیان پێ بدەیت، دەبن بە خوو و نەخۆشییەکی وەهمی. بەڵام تۆ هەرگیز مەترسە و، بزانە ئەوە نەخۆشیی "دڵ" نییە، چونکە ئەو چرپە چرپانەی نەفس و ئەو فووپیاکردنانەی شەیتان زۆربەی کات بە بێ ویستی خۆمان لە

دەروونماندا دروست دەبن، هەر لەبەر ئەوەشە کە خوای گەورەی میهرەبان تۆماری ناکات لەسەرمان. ئەم جۆرە بیرکردنەوانەش زیاتر لەناو ئەو کەسانەدا باون کە خاوەنی میزاجێکی توند و تیژن. بەڵێ، شەیتان لەگەڵ ئەم وەسوەسانەدا بە قووڵی ڕۆدەچێت.

*چارەسەریی ئەم دەردەش ئەوەیە کە بزانیت:*

ئەم بیرکێشەکییانە هیچ بەرپرسیارییەکیان تێدا نییە، چونکە زۆربەیان بە بێ ویستی خۆمان پەیدا دەبن، ئەوەتا سروشتی ئەو بیرانە وەهایە کە تەنها دراوسێیەتی نەبێ چیی تریان لە نێوانیدا نییە و ناچنە ناو یەکترییەوە و زیان لە یەکتر نادەن. چونکە هەروەك دراوسێیەتیی مەلائیکەتی ئیلهام و شەیتان لە دەوروبەری دڵدا و، دراوسێیەتیی پیاوچاکان و خراپکاران لە یەك جێگادا، هیچ زیانێکی نییە.. هەر بەو جۆرەش هاتنی بیرە خراپەکان - بە بێ هیچ ویست و مەبەستێك - لەگەڵ بیرە پاکەکان بە دڵی مرۆڤدا، هیچ زیانێکی تێدا نییە. مەگەر ئەو خەیاڵ و ختوورە خراپانە بە "مەبەست" دروست بووبن، یان لەرادەبەدەر خۆتیان پێ سەرگەرم بکەیت و پێت وابێت زیانیان هەیە. خۆ کاتی وا دەبێ "دڵ" زۆر ماندووە و "بیر" هەرچییەکی لێ هەڵبکەوێت - با سوودیشی نەبێت - خۆی پێوە سەرقاڵ دەکات. شەیتانی لەعنەتیش ئەمە بە هەل دەزانێت و خەیاڵە چەپەڵەکانی خۆی، بەوپەڕی دەستبڵاوی، بەم لاو ئەو لادا دەپرژێنێت و، بە چەشنی چەند داوێك بەکاریان دەهێنێت و دڵە پاك و ئارامەکانی پێ دەکات بە تەڵەوە!

○ ڕووی چوارەم:

ئەمەش جۆرە وەسوەسەیەکە لەوەوە پەیدا دەبێت کە مرۆڤ زۆر بە گەرموگوڕی و لەرادەبەدەر هەوڵ بدات کردەوە چاکەکانی لەسەر تەواوترین شێوە بن.

خۆ مرۆڤ هەتا زیاتر لەمەدا ڕۆبچێت و بە توند و گەرمتر بیگرێت و ناوی تەقوا و وەرعیشی لێ بنێت، مەسەلەکە پتر ئاڵۆز دەبێت، بگرە ئەوەندەی نامێنێت ئەو مرۆڤە بکەوێتە ناو حەرامەوە لەو کاتەدا کە بە شوێن ڕوو و شێوەی تەواوتردا دەگەڕێت، تەنانەت جاری وا دەبێ کە بەهۆی گەڕانی بە شوێن "سوننەت"ێکدا "واجب"ێك واز لێ دەهێنێت! چونکە هەردەم لەبارەی ئەوەی کە (ئایا کردەوەکانم ڕاستن یان نا؟ وەردەگیرێن یان نا)؟ پرسیار لە خۆی دەکات و، ئەوەندەش ئەم پرسیارانە دووپات دەکاتەوە تا لە کۆتاییدا دووچاری نائومێدی دەبێت و، بەمەش دەرفەت بە شەیتان دەدات تا سوودی لێ وەربگرێت. ئنجا شەیتانیش بە تیرە ژەهراوییەکانی خۆی دڵی ئەو مرۆڤە دادەگرێتەوە و قووڵایی ناخی دڵی دەپێکێت و زامداری دەکات.

*ئەم زامەش بە دوو دەرمان تیمار دەکرێت:*

**دەرمانی یەکەم:** باش بزانە کە ئەم جۆرە وەسوەسانە تەنها شایستەی موعتەزیلـەکانن (نـەك ئەهلی سوننەت و جەماعەت). چونکە موعتەزیلـەکان دەیـانوت: کردەوەکـان لـە خۆیـاندا و سەبارەت بە پاداشت و تۆڵەی دواڕۆژ "باش" یان "خراپ"ن، ئنجـا کـە "شـەرع" دێـت بڕیـار لەسەر ئەو باشی و خراپی‌یە دەدات و دانی پێـدا دەنێـت. واتە باشـی و خراپی، سـەبارەت بـە پاداشـت و تۆڵــەی دواڕۆژ، دوو شــتی خۆیــین و لــە سروشــتی شــتەکاندا هــەن، فــەرمان و نەهی‌یەکانی شـەرعیش شـوێنکەوتەی کردەوەکـانن و لەسـەر ئەو بناغەیە بڕیـاری شـەرعیان لەسەر دەردەچێت.

لەبەر ئەوە، سروشتی ڕێڕەوی ئیعتیزال وایە کە مرۆڤ وا لـێ دەکـات هەمیشـە لـە هـەموو کرداریکدا پرسیار بکات و بڵێ:

(ئایا بلێی کردەوەکەم بە چەشنێك ئەنجام دابێــت کـە مایـەی ڕەزامـەندیی خـوا بێـت، وەك خۆی لە خۆی‌دا وایە، یان نا)؟

بەڵام حەقڕەوان، کە ئەهلی سوننەت و جەماعەتن، دەڵێن:

کـاتێك خـوای گـەورە کـە فـەرمان بـە کردنـی شـتێك دەدات، ئـەوا ئـەو شـتە بـە "بـاش" دەژمێررێت و، هەرکاتیش نەهیی لە کردنی شتێك کرد ئەوا ئەو شتە بـە "خـراپ" دادەنرێـت. واتە بە "ئەمر و نەهی"ی شەرع بـاش و خـراپ دەردەکـەون و دەستنیشـان دەکرێـن. واتـە ئیـتر چاك و خراپ لە بەرچاوی مرۆڤدا دیارن و پەیوەندیشیان بە ئەنجامی ئەودنیاوەیە نەك ئەمدنیا.

بۆ نموونە: ئەگەر دەستنوێژت گرت یان نوێژت کرد، لە هەمان کاتدا شـتێك ڕووی دابـوو کە پێت نەزانیبوو نوێژ و دەستنوێژەکەی تۆی بەتاڵ دەکردەوە، ئـەوا (لای ئـەهلی سـوننەت و جەماعـەت) نوێـژ و دەسـتنوێژەکەت تـەواون و بـەتاڵ نەبوونەتـەوە و، لـە هـەمان کاتیشـدا کردەوەیەکی "باش"ن.

بەڵام موعتەزیلەکان لایان وایە کە هەردووکیان بەتاڵ و "خـراپ"ن، ئـەوەندە هەیـە لەبـەر پێ نەزانینت - چونکە نەزانین دەبێت بە عوزر و بەهانە - لێت وەردەگیرێن.

کەواتە ئەی ئەو برایەی کە دووچاری دەردی وەسوەسە بووە!

بەم جۆرە و بەپێی ڕێڕەوی ئەهلی سوننەت و جەماعـەت، ئـەو کردەوەیـەت ڕاسـتە و هیـچ کەکەیەکی بەسـەرەوە نی‌یـە. چونکـە بـە گوێـرەی ڕواڵـەت‌بینیی شـەرع بـە تـەواو دادەنرێـت.

كه‌واته ئیتر نابێت سه‌باره‌ت به‌ ڕاستی و دروستیی كرده‌وه‌كانت وه‌سوه‌سه‌ت بێت. به‌ڵام له‌ هه‌مان كاتیشدا نابێ به‌و كرده‌وانه له‌ خۆت بایی ببیت، چونكه به‌ دڵنیایی نازانیت ئایا خوای گه‌وره‌ ئه‌و كرده‌وه‌یه‌ی لێ وه‌رگرتوویت یان نا؟ به‌ڵكو ده‌بێ له‌ نێوان ترس(خوف)ی وه‌رنه‌گرتن و ئومێد(رجاء)ی وه‌رگرتندا بیت و، هه‌میشه‌ هاوسه‌نگیی ئه‌م دوانه ڕابگریت. مادام مرۆڤێكی هۆشیار و وریابیت.

**ده‌رمانی دووهه‌م:** باش بزانه ئایینی ئیسلام - كه ئایینی ڕاست و ڕه‌وای خوایه - هیچ ماندوو كردنێكی تێدا نییه و، هه‌ر چوار مه‌زهه‌به‌كانیش له‌سه‌ر حه‌قن.

جا مادام ئه‌مه وایه و، له لایه‌كی تریشه‌وه تاوان و كه‌مته‌رخه‌می به‌ تۆبه و داوای لێبوردن نامێنن و له‌ناو ده‌چن و، ئه‌م داوای لێبوردنه‌ش له تای ته‌رازوودا زۆر له‌و غرروور و له‌خۆبایی‌بوونه قورس تره كه له ڕازی‌بوونه‌وه له كرده‌وه چاكه‌كان په‌یدا ده‌بێت. له‌به‌ر ئه‌مانه، ئه‌گه‌ر بێت و مرۆڤ خۆی به‌ خاوه‌ن قسوور و كه‌مته‌رخه‌م بزانێت و پاشان تۆبه‌ی لێ بكات، به‌ هه‌زاران جار باشتره له‌وه‌ی كه له خۆی بایی ببێت و له كرده‌وه‌كانی ڕازی بێت و پێیان بنازێت. جا مادام وایه، ئه‌وا هه‌رچی وه‌سوه‌سه هه‌یه به یه‌ك جار فڕێیان بده و له ڕووی شه‌یتان هه‌ڵبگه‌ڕێره‌وه و پێی بڵێ:

ئه‌وه‌ی تۆ به منی ده‌كه‌یت بریتییه له ماندووكردن(الحرج). خۆ زانینی ڕاستیی ئه‌م حاڵانه‌ش شتێكی گرانه و پێچه‌وانه‌ی ئه‌و ئاسانییه‌یه كه له ئاییندا ڕه‌چاو كراوه و، به ته‌واوی دژی ئه‌و ده‌ستووره‌یه كه ده‌ڵێت : "الدين يُسْرٌ" یان: "لا حرجَ في الدين". كرده‌وه‌كانی من - بێ هیچ گومانێك - له‌گه‌ڵ یه‌كێك له ڕێڕه‌وه ئیسلامییه حه‌ق و ڕه‌واكاندا - به ویستی خوا - یه‌كده‌گرنه‌وه. خۆ من ئه‌م ئه‌ندازه‌یه‌م له‌م وه‌سوه‌سانه به‌س و سه‌روزیاده، چونكه هیچ نه‌بێ بۆ من بوون به هۆكارێكی باشی ئه‌وتۆ كه هه‌ست به هه‌ڵه‌ی خۆم بكه‌م و خۆم بهاومه به‌رده‌ستی به‌دیهێنه‌ری خۆم و، سوژده‌ی بۆ ببه‌م و به نزا و پاڕانه‌وه لێی بلاڵێمه‌وه و داوای لێبوردنی لێ بكه‌م، پاشان له حوزووری ئه‌و خواوه‌نده‌دا، كه تابڵێی به هه‌موو شتێك بیسه‌ر و بینایه، دان به ناته‌واوی و قسووره‌كانمدا بنێم.

○ **ڕووی پێنجه‌م:**

ڕووی پێنجه‌م ئه‌و وه‌سوه‌سانه‌یه كه شێوه‌ی گومان كردن له "بابه‌ته‌كانی ئیمان" وه‌رده‌گرن.

ئه‌و مرۆڤه‌ی كه له‌مه‌وه دووچاری وه‌سوه‌سه ده‌بێت و ده‌كه‌وێته سه‌رگه‌ردانییه‌وه، زۆر جار گومان و دوودڵییه‌كانی "ئه‌ندێشه"ی لێ تێكده‌چێت و پێی وا ده‌بێ كه له "عه‌قڵ"ـه‌وه

پەیدا بوون. ئنجا وا گومان دەبات كە ناتەواوی لە بیر و باوەڕەكەیدا دروست بووە.. یان لای وا دەبێ ئەو گومانانەی بە وەهمیدا هاتوون هەموویان "دوودڵی"ن و زیان بە ئیمانەكەی دەگەیەنن.. یان پێی وا دەبێ ئەو گومانانەی كە بە تەسەووریدا هاتوون، "عەقڵ"یشی باوەڕی پێ كردوون.. یان هەندێ جار وا دەزانێت كە هەر بیركردنەوەیەك لە بارەی بابەتەكانی كوفرەوە، مرۆڤی پێ كافر دەبێت. واتە هەرچی بیركردنەوە و لێكۆڵینەوە و تەرازووكاریی عەقڵیی بێلایەنانە هەن سەبارەت بە ناسینی هۆی گومڕایی، ئەم بە چەند هۆكارێكیان لە قەڵەم دەدات كە سەریان لە گومڕاییەوە دەردەچێت و پێچەوانەی ئیمانن!

ئیتر بەم جۆرە دەكەوێتە لەرزە و دڵەتەپێ و، لە بەردەم ئەم هەموو فڕوفێڵانەی شەیتاندا ورە و بەرگریی نامێنێت و هاوار دەكات:

(چەندە بەدبەختم! وا دڵم لەدەست دەرچوو و بیر و باوەڕیشم سەری لێ شێوا)!

جا لەبەر ئەوەی زۆربەی جار ئەم حاڵەتانە بە بێ ویستی مرۆڤ پەیدا دەبن، ئەوا ئەم مرۆڤە بە ویستی هەندەكیی خۆی(إرادته الجزئية) ناتوانێت چاریان بكات. تا لە ئەنجامدا دەست لە ئەژنۆ دادەمێنێت و دەكەوێتە نێوان نائومێدییەكی كوشندەوە!

*چارەسەری ئەمەش بەوە دەبێت كە بزانیت:*

هەروەك ئەگەر "كوفر" بە "خەیاڵ"دا بێت مرۆڤی پێ كافر نابێت، هەر بەو جۆرەش گەر بە "وەهمی"دا بێت پێی كافر نابێت..

هەروەها وەك "بیركردنەوە" لە "گومڕایی" مرۆڤ گومڕا ناكات، بە هەمان جۆر "تەسەوور كردن"یشی مرۆڤی پێ گومڕا نابێت!

چونكە هەركام لە: "خەیاڵكردن" و "بەوەهمدا هاتن" و "تەسەور كردن" و "بیركردنەوە" تابلێی سەربەخۆ و جیاوازن لە: تەسدیق كردنی "عەقڵ" و ملكەچیی "دڵ" بۆ هەر شتێك.

لە ڕاستیشدا هەریەكە لە: "خەیاڵكردن" و "بەوەهمدا هاتن" و "تەسەوركردن" و "بیركردنەوە" تا ڕادەیەك سەربەست و ئازادن، كەواتە بایەخ بەو جوزئی ئیختیارییە نادەن كە لە ویستی مرۆڤەوە سەری هەڵداوە. هەروەها بە زۆری ملیش بۆ ئەرك و واجبە ئایینییەكان كەچ ناكەن.

بەڵام تەسدیق و ملكەچی (كە لە عەقڵ و دڵەوەن) بەو جۆرە نین، بەڵكو بە تەرازوویەكی یەكجار وردەوە بەستراونەتەوە.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌: "خه‌یاڵكردن" و "به‌وه‌همدا هاتن" و "ته‌سه‌ور كردن" و "بیر كردنه‌وه" هیچیان به‌ ته‌سدیق و ملكه‌چی له‌ قه‌ڵه‌م نادرێن، ئه‌وا هه‌رچی‌یه‌ك له‌ ڕێگایانه‌وه‌ په‌یدا ببێت به‌ "گومان" ته‌نانه‌ت به‌ "دوودڵی"ش نازمێررێت.

به‌ڵام ئاگادار به‌! ئه‌گه‌ر بێت و به‌ بێ هیچ هۆیه‌ك ئه‌م حاڵه‌ته‌ دووپات ببێته‌وه‌ ئه‌وا دوور نی‌یه‌ له‌ قووڵایی ده‌روونندا جێگای خۆی بكاته‌وه‌. خۆ ئه‌گه‌ر - خوا نه‌خواسته‌ - له‌وێدا جێگیر بوو، ئه‌وا جۆره‌ گومانێكی ڕاسته‌قینه‌ی لێ په‌یدا ده‌بێت. ئیتر ورده‌ ورده‌ و له‌سه‌رخۆ و به‌ ناوی دادوه‌ریی ژیری(موحاكه‌ماتی عه‌قلی)ی بێ لایه‌ن و به‌ ناوی ویژدان و شتی تریشه‌وه‌ پێی هه‌ڵده‌خلیسكێت و كه‌م كه‌م وته‌كانی لایه‌نی به‌رامبه‌ر (واته‌ له‌و موحاكه‌مه‌ عه‌قلی‌یه‌دا) وه‌رده‌گرێت، به‌ بێ ئه‌وه‌ی كه‌ هیچ ویستێكی خۆیشی تێدا بووبێت یان به‌ خۆی زانیبێت. خۆ كه‌ ئه‌مه‌ش ڕووی دا، ئه‌وا به‌ ته‌واوی واز له‌ هه‌موو ئه‌و ئه‌رك و واجبانه‌ ده‌هێنێت كه‌ ده‌بێ بۆ خواوه‌ندی حه‌قیان به‌جێ بهێنێت. ئیتر ئه‌و سته‌مكاره‌ی كه‌ به‌م جۆره‌ سته‌می له‌ خۆی كردووه‌. حاڵه‌تێكی وای له‌ زیهندا دروست ده‌بێت وه‌ك بڵێی له‌ لایه‌نی به‌رامبه‌ره‌وه‌ - كه‌ شه‌یتانه‌ - مۆڵه‌ت درابێت!

له‌وانه‌یه‌ گرنگترین جۆره‌كانی ئه‌م وه‌سوه‌سه‌ سامناكه‌ ئه‌وه‌ بێت كه‌: ئه‌م سه‌ر لێ‌شێواوه‌ی دووچاری وه‌سوه‌سه‌ بووه‌، گونجانی خۆیی(الإمكـان الـذاتي) و گونجانی زیهنی(الإمكان الذهني)ی لێ تێكده‌چێت و له‌ به‌رچاوی‌دا ئاڵوگۆڕ ده‌بن. واته‌ زیهنی وه‌هم ده‌بات و عه‌قڵیشی له‌و شته‌دا - كه‌ له‌ خۆی‌دا شتێكی گونجاوه‌ - ده‌كه‌وێته‌ گومانه‌وه‌. كه‌چی ده‌ستوورێك له‌ زانستی "مه‌نتیق"دا هه‌یه‌ ده‌ڵێت :

"الإمكان الذاتي لا ينافي اليقين العلمي ولايتضاد مع الضرورة الذهنية وبديهياتـها".

واته‌: گونجانی خۆیی دژ و پێچه‌وانه‌ی یه‌قینی زانستی نی‌یه‌ و هیچ دژایه‌تی‌یه‌كی له‌گه‌ڵ شته‌ به‌دیهی‌یه‌كاندا نی‌یه‌.

بۆ ڕوونكردنه‌وه‌ی ئه‌مه‌، وا ئه‌م نموونه‌یه‌ ده‌هێنینه‌وه‌:

ده‌گونجێ "ده‌ریای ڕه‌ش" ئێستا له‌ جێی خۆی‌دا ڕۆبچێت. ئه‌مه‌ به‌پێی ئیمكانی خۆیی شتێكی گونجاو(ممكن)ه‌. به‌ڵام ئێمه‌ به‌ دڵنیایی‌یه‌وه‌ باوه‌ڕمان به‌وه‌ هه‌یه‌ كه‌ ئه‌و ده‌ریا ناوبراوه‌ هه‌یه‌ و له‌ جێگاكه‌ی ئێستای خۆی‌دا جێگیر بووه‌ و، هیچ گومانێكمان له‌مه‌دا نی‌یه‌. كه‌واته‌ ئه‌و ئیحتیماله‌ مومكین و ئیمكانه‌ خۆیی‌یانه‌ی كه‌ باس كران، هیچ گومان و دوودڵی‌یه‌ك دروست ناكه‌ن و دڵنیاییمان ناشێوێنن.

نموونەیەکی تر:

دەگونجێ ئەمڕۆ خۆر ئاوا نەبێت، هەروەها دەشگونجێ سبەینێ هەڵنەیەت! بەڵام ئەم گونجانە هیچ زیان و گومانێك لە یەقینماندا دروست ناکات.

هەر بەو جۆرەش هەموو ئەو وەهمانەی کە لە ئیمکانی خۆییەوە دێن، سەبارەت بە ئەوابوونی ژیانی دنیا و هەڵهاتنی ژیانی ئەودنیاوە، کە ئەمانەش لە ڕاستییە پەنهانەکانی ئیمانن، ئەو وەهمانە هەرچەندە و هەرچۆن بن، هەرگیز کەلێن لەو دڵنیاییەی ئیمانماندا دروست ناکەن و زیانی پێ ناگەیەنن. هەر لەبەر ئەوەیە کە لە زانستی "أصول الدین" و "أصول الفقه"دا ئەو دەستوورە بڕیاری لەسەر دراوە کە دەڵێت:

"لا عبرة للإحتمال غیر الناشئ عن الدلیل".

واتە: بایەخ بەو ئیحتیماله نادرێت کە لە بەڵگەوە پەیدا نەبوو بێت.

**ئەگەر دەپرسیت و دەڵێیت:**

حیکمەتی تووشبوونی باوەڕداران بەم وەسوەسانە چییە، کە دەروون سەخڵەت دەکەن و ئازاری دڵی مرۆڤ دەدەن؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

ئەگەر لە ڕاستیدا ئێمە زیادەڕەوی و زاڵبوونی وەسوەسە بخەینە لاوە، ئەوا ئەو کاتە - پشت بە خوا - ئەم وەسوەسانە بۆ ئێمە دەبن بە:

هاندەری بێداری و، پاڵ پێوەنەر بۆ گەڕان و پشکنین و، هۆیەك بۆ جیددیەت و لێبڕان و، دەرکەری کەمتەرخەمی و تەمبەڵی!

جا لەبەر هەموو ئەمانە، خوای گەورە لەم گۆڕەپانی پێشبڕکێ و تاقیگەیەی دنیادا، وەسوەسەی وەك شووڵێك لێ کردووە و داویەتی بە دەست شەیتانەوە، تاکو بەو شووڵە خەڵکی بەرەو ئەو حیکمەتانە بداتەبەر! خۆ ئەگەر زۆر ئازاریشی داین، ئەوا بە: "أعوذ بالله من الشیطان الرجیم" تەنها هانا بۆ لای خواوەندی زانا و دانا دەبەین!

# وتەی بیست و دووهەم

ئەم وتەیە بریتی‌یە لـە دوو مەقام

## مەقامی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَيَضْرِبُ اللّٰهُ الأَمثالَ لِلنّاسِ لَعَلَّهُم يَتَذَكَّرُون﴾ (ابراهيم:٢٥)

﴿وَتِلكَ الأَمثالُ نَضْرِبُها لِلنّاسِ لَعَلّهُمْ يَتفكّرون﴾ (الحشر:٢١)

جارێکیان دوو کەس لە گۆمێکی گەورەدا خۆیـان دەشۆرد و مەلـەیان دەکـرد تـا بڕسیان لـێ بڕا و هێندە ماندوو بوون کە لە هۆشی خۆیان چوون و بوورانـەوە. کاتـێ لـەو بێهۆشـی‌یە بێـدار بوونـەوە و بـە وردی سـەرنجی دەوروبـەریان دا بۆیـان دەرکـەوت کـە لـە جیهانەکـەی خۆیـاندا نـەماون و هێنراونەتـە جیـهانێکی دیـی تـەواو جیـاواز لـە جیهانەکـەی پێشـوویان. جیهانێك سـەرتاپا خـۆی و سـەرجەمی شتانی نـاوی سـەیر و سەرسـووڕهێنەر بـوون. چونکـە ڕێکوپێکیی ئەو جیهانە نوێ‌یە ئەوەندە ورد و ناوازە بوو دەت وت وڵاتێکی ئەوتۆیە کە تابڵێی بە وردی و ڕێکی بایەخ بە گشـت لایـەن و گۆشـەیەکی دراوە و.. لـە جوانـی و قەشەنگیشـدا چەشنی شارێکی ئاوەدان خۆی دەنواند و.. ئەوەندەش پەیوەندیی نێوان پایـەکانی ئـەو جیهانـە توندوتـۆڵ و مەحکـەم بـوون کـە کتومـت ڕوخسـاری کۆشـکێکی قـایم و نـاوازەی نوێیـان گرتبووەخۆ.

هـەردووك بـە تاسـە و ئارەزوومەندی‌یـەوە سـەیری دەوروبـەری خۆیانیـان دەکـرد، لـە ڕاستیشدا ئەو جیهانەی کـە ئـەوان ڕووبـەڕووی بووبوونـەوە هێنـدە مـەزن بـوو کـە بـە جـارێ ئـەمانی خستبووە سەرسووڕمان و گرفتـاری سەرسـامیی کردبـوون، چونکـە ئەگـەر سـەیری لایەنێکی ئەو جیهانە بکرایە ئـەوا وڵاتێکـی ڕێکوپێـك دەبینـرا و، گـەر تەماشـای گۆشـەیەکی

تری بکرایە شارێکی کامڵ دەردەکەوت و، خۆ گەر بۆ ڕوویەکی دیکەی بڕوانرایە ئەوا کۆشکێکی گەورەی وا مەزن دەبینرا کە جیهانێکی سامناکی لە ئامێز گرتبوو!

پێکەوە کەوتنە گەڕان بەناو ئەم جیهانە سەرسووڕهێنەرەدا، لە گەشت و گەڕانەکەیاندا چەند بەدیهاتوویەکیان دی بە جۆرە زمانێکی تایبەتی لەگەڵ یەکتردا دەدوان کە ئەمان لێی تێ نەدەگەیشتن، بەڵام لە ئاماژە و هێماکانیانەوە هەستیان کرد کە ئەوانە چەند کار و ئەرکێکی گەورە و گرنگ ئەنجام دەدەن.

یەکێکیان بەوی تری وت:

- بێ گومان ئەم جیهانە سەرسووڕهێنەرە کارسازێکی هەیە کاروبارەکانی دەسازێنێ و بەڕێوەیان دەبات.. ئەم وڵاتە ناوازەیەش خاوەنێکی هەیە چاودێریی دەکات.. ئەم شارە ڕەنگینەش گەورەیەکی هەیە هەموو کاروباری شاری بەدەستە.. ئەم کۆشکە مەزنەش بیتنەرێکی بێ وێنەی هەیە کە بەم شێوە ناوازەیە دایهێناوە.

لەبەر ئەوە، من بە پێویستی دەزانم هەوڵی ناسینی بدەین، چونکە وا دیارە هەر ئەوە کە ئێمەی هێناوەتە ئێرە، جا ئەگەر نەیناسین دەبێ کێ بێت - جگە لەو - بێت بەهانامانەوە و فریامان بکەوێت و لەم جیهانە نامۆیەدا گیروگرفتەکانمان لەکۆڵ بکاتەوە و پێداویستییەکانمان بۆ فەراهەم بهێنێت؟ ئایا تۆ هیچ تروسکایییەکی هیوا و ئومێد لەو بوونەوەرە لاواز و کۆڵەوارانەوە شك دەبەیت کە لە زمانیان تێناگەین و ئەوانیش گوێ بۆ ئێمە ڕاناگرن؟.. پاشان ئەو کەسەی کە ئەم جیهانە مەزنەی لە شێوەی وڵاتێکی ڕێك و لە شکڵی شارێکی قەشەنگ و لە ڕوخساری کۆشکێکی ناوازەدا بنیاتناوە و، چەشنی گەنجینەیەکی پڕ لە شتانی دەراسا(خارق) بەکاری هێناوە و، بە قەشەنگترین ئارایشت و جوانی ڕازاندوویەتەوە و، هەموو گۆشە و سووچ و لایەنێکیشی بە چەندەها موعجیزاتی پڕ لە دەست و واتای بەرز و بڵند ئارایشت داوە.. ئەو بنیاتنەرەی کە خاوەنی ئەم هەموو شکۆمەندی و مەزنییەیە و، ئێمە و ئەم دەوروبەرەی ئێمەشی هێناوەتە ئێرە.. ئەو کەسە - بێ هیچ گومانێك - نیازێکی بەم گشت کارانە هەیە و هیچیان هەڕەمەکی و بێمەبەست نین. کەواتە دەبێ ئێمە لە پێش هەموو شتێکدا بە باشی بیناسین و پاشان هەر لە ڕێی خۆیەوە بزانین چیی لە ئێمە دەوێ و داوای چیمان لێ دەکات؟

هاوڕێکەی پێی وت:

- واز لەم قسانە بهێنە! من باوەڕ ناکەم یەکێکی تاکی تەنیا هەبێت ئەم جیهانە ناوازەیە بەڕێوە ببات!

وه‌ڵامی دایه‌وه‌:

– كاكی هاوڕێم! له‌سه‌رخۆبه‌! كه‌مێ گوێم لێ ڕابگره‌. گه‌ر ئێمه‌ ناسینی ئه‌و پشت‌گوێ بخه‌ین ئه‌وا – وه‌ك ئاشكرایه‌ – هیچ ده‌ستكه‌وتێكمان نابێت. به‌ڵام گه‌ر هه‌ر زیانێك له‌و پشت‌گوێ خستنه‌دا ببێت، زیانێكی گه‌لێ گه‌وره‌ ده‌بێت. خۆ ئه‌گه‌ر به‌ پێچه‌وانه‌شه‌وه‌، بۆ ناسینی ته‌قالا بده‌ین و له‌ ئه‌نجامدا بیناسین دووچاری هیچ چه‌شنه‌ گیروگرفتێك نابین و زیانیشمان پێ ناگات، به‌ڵكو گه‌لێ سوودی گه‌وره‌ و مه‌زنیشمان ده‌ستگیر ده‌بێت. كه‌واته‌ ئێمه‌ كارێكی گه‌لێ نابه‌جێ و نه‌شیاو ده‌كه‌ین گه‌ر هه‌ر ئاوا بمێنینه‌وه‌ و بایه‌خ به‌ ناسینی ئه‌و نه‌ده‌ین.

به‌ڵام هاوڕێ بێ‌ئاگاكه‌ی وتی:

– من له‌م قسانه‌دا له‌گه‌ڵت نیم! من حه‌وانه‌وه‌ و شادیی خۆم له‌وه‌دا ده‌بینم كه‌ هه‌رگیز بیر له‌م شتانه‌ نه‌كه‌مه‌وه‌ و، ئه‌و بنیاتنه‌ره‌ ناوازه‌یه‌ش نه‌ناسم كه‌ تۆ لێی ده‌دوێیت! هیچ داخوازێك شك نابه‌م كه‌ خۆم له‌ شتێكدا ماندوو بكه‌م ژیریم وه‌ری‌نه‌گرێت و په‌یی پێ نه‌بات، به‌ڵكو پێم وایه‌ هه‌موو ئه‌م كارانه‌ی ده‌یانبینین تێكڕا به‌رهه‌می "ڕێكه‌وت"ن و چه‌ند شتێكی تێهه‌ڵكێشن و له‌ ڕه‌فتار و كاروباریشیاندا بۆ خۆیان سه‌ربه‌ست و سه‌ربه‌خۆن! من چیم له‌م شتانه‌ داوه‌؟

ژیره‌كه‌یان وه‌ڵامی دایه‌وه‌:

– ده‌ترسم ئه‌م سه‌رسه‌ختی‌یه‌ی تۆ ئێمه‌ش و كه‌سانی تریش دووچاری چه‌ندین گیروگرفت و ده‌ردی‌سه‌ری بكات! چونكه‌ ئایا هه‌ر له‌ ئه‌نجامی هه‌رزه‌یی مرۆڤێكی به‌دبه‌خت و، ڕه‌فتاری چه‌واشه‌ و نه‌فامانه‌ی كه‌سێكی له‌ڕێ‌لاده‌ری وه‌ك تۆوه‌ نه‌بوو كه‌ چه‌نده‌ها شاری ئاوه‌دان، وێران و كاول كران؟!

جارێكی تر هاوڕێ بێ‌ئاگاكه‌ی لێی ڕاپه‌ڕی و وتی:

– با به‌ یه‌كجاری ئه‌م بابه‌ته‌ ببڕینه‌وه‌ و ئه‌م باسه‌ یه‌كلایی بكه‌ینه‌وه‌. یان ده‌بێ به‌ چه‌شنێكی گومان نه‌هێڵ بۆم بچه‌سپێنیت كه‌ ئه‌م وڵاته‌ خاوه‌ن و بنیاتنه‌رێكی تاك و ته‌نیای هه‌یه‌، یاخود وازم لێ بهێنه‌ و كارت به‌سه‌رمه‌وه‌ نه‌بێت!

هاوڕێكه‌ی وه‌ڵامی دایه‌وه‌:

– مادەم تۆ – ئه‌ی هاوڕێكه‌م! – تا ڕاده‌ی شێتی و وڕێنه‌كردن له‌سه‌ر ملنه‌دان و سه‌رسه‌ختیی خۆت سوور و به‌رده‌وامیت، به‌ ئه‌ندازه‌یه‌كی ئه‌وتۆ كه‌ له‌وانه‌یه‌ ئه‌م سه‌رسه‌ختی‌یه‌ت ئێمه‌ش و وڵاته‌كه‌ش گرفتاری فه‌نا و وێرانی بكات، ئه‌وا من "دوازده‌" به‌ڵگه‌ ده‌خه‌مه‌ پێش‌چاوت تاكو بۆت بچه‌سپێنم كه‌ ئه‌م جیهانه‌ی له‌ ناوازه‌یی‌دا وه‌ك كۆشك وایه‌ و.

ئەم وڵاتەش کە لە ڕێکوپێکی‌دا دەڵێی شارێکی ئاوەدانە، بنیاتنەرێکی ناوازە و داهێنەرێکی تاك و تەنیای هەیە، کە هەر تەنها ئەوە گشت کاروبارەکانی ئێرە دەسازێنێت و بەڕێوەیان دەبات، بە ڕادەیەك کە هەر بە چاوی خۆت هیچ ناتەواوی و نەنگی‌یەك لە هیچ شتێکدا نابینیت. ئەو بنیاتنەرەی کە ئێمە نایبینین، ئەو ئێمەش و هەموو شتێکی تریش دەبینێت و گشت گوفتارێك دەبیستێ و سەرجەمی کارەکانیشی دەراسا و قەشەنگ و نیشانەی زانستن. ئەم بوونەوەرانەش - کە ئێمە لە زمانیان حاڵی‌نابین - چەند ئەرك پێ‌سپێرراو و کارمەندێکن لە وڵاتەکەی ئەودا کاردەکەن و ئاوەدانی دەکەنەوە.

## ▢ بەڵگەی یەکەم:

وەرە ئەی هاوڕێ‌کەم! با پێکەوە سەرنج لە شتانی دەوروبەرمان بدەین، ئایا نابینیت دەستێکی پەنهان هەیە کە لە پشتی هەموو ڕووداوەکانەوە کار دەکات؟.. ئایا نابینیت ئەو شتەی کە هەر خاوەنی هیچ هێزێك نی‌یە و ناتوانێت خۆیشی هەڵبگرێت، کەچی هەزاران ئەوەندەی توانای خۆی کۆڵی قورسی لە کۆڵی خۆی ناوە و هەڵی‌گرتوون[1] ؟.. ئایا نابینیت ئەو شتەی کە خاوەنی هەست و نەست و پەی پێ‌بردن نی‌یە، کەچی کاری وا ڕادەپەڕێنێت کە لەوپەڕی دانایی‌دایە[2] ؟ کەواتە ئەم شتانە بە سەربەخۆیی کار ناکەن، بەڵکو خاوەنێکی زاناو بنیاتنەر و دروستکەرێکی بەتوانایان هەیە لە پشتی پەردەوە بەڕێوەیان دەبات. چونکە گەر بهاتایە و سەربەخۆ بوونایە و کاروباری خۆیان بە دەستی خۆیان بوایە، ئەوا دەبوو هەموو شتێکی ئێرە خاوەنی موعجیزەیەکی دەراسا و لەعادەت‌بەدەر بوونایە. دیارە ئەمەش وڕێنەیەکی پووچی بێ کاکڵە و واتایە.

## ▢ بەڵگەی دووهەم:

وەرە - ئەی هاوڕێ‌کەم! - با بە وردی سەیری ئەم شتانە بکەین کە هەموو مەیدانەکانیان بە تەواوی ڕازاندووەتەوە. چونکە لە یەك‌بەیەکی ئەو ئارایشتانەدا چەندین نیشانە و شتانی ئەوتۆ هەن کە هەواڵی خاوەنی ئەم جیهانەمان دەدەنێ و بۆ لای ئەو ڕێنماییمان دەکەن، بە ڕادەیەك کە دەڵێی یەك‌بەیەکی ئەو نیشانانە مۆر و تەمغە و سکەی خاوەنی ئەم جیهانەن، کتومت وەك مۆر و تەمغەی پادشا کە بەڵگەن لەسەر بوونی و، چەشنی سکەی فەرمانڕەواش کە لەسەر دراوەکانی‌دا نەخشێنراوە و، مەزنی و سام و شکۆی پادشا و فەرمانڕەوامان پێ ڕادەگەیەنن. گەر حەز دەکەیت بە ڕوونی لەمە تێ‌بگەیت، ئەوا فەرموو سەیری ئەم تەنۆلکە

---

(١) ئاماژەیە بۆ: "تۆو" و "ناوك" کە چەندین درەختی زەبەلاح هەڵدەگرن. (دانەر)

(٢) ئاماژەیە - بۆ نموونە - بۆ قەدی مێو کە لە خۆی‌دا لاوازە و ناتوانێت هێشووە پڕەکانی خۆی هەڵبگرێت و، ناچار دەستە نیانەکانی لە ملی درەختەکانی دەوروبەری دەئاڵێنێت. (دانەر)

بچووكه بكه كه هێنده ورده نزیكه مرۆڤ نرخی نه‌زانێت و وه‌خته هه‌ر بایه‌خی پێ نه‌دات كه‌چی خاوه‌نه‌كه‌ی چه‌ندین "تۆپ" كـووتاڵ و پارچـه‌ی چنراوی ڕه‌نگاوڕه‌نگ و پڕ نه‌خش و نیگـاری سـه‌رنج ڕاكێشـی لـێ دروسـت كـردووه و، بـه‌روبوومی لـه حه‌لوا و شیرینی‌یه‌كانیش به‌له‌زه‌تتری لـێ ده‌رهێناوه، به ڕاده‌یه‌ك كه ئه‌گه‌ر هـه‌زاران كه‌سی وه‌ك ئێمه ئه‌و كووتاڵ و پارچه چنراوانه له‌به‌ر بكه‌ن و له‌و خواردەمه‌نی‌یانه‌ش بخۆن، هێشتا هـه‌ر ته‌واو نابن.

پاشان بڕوانه، ئه‌وه‌تا به ده‌سته غه‌یبی و په‌نهانه‌كه‌شی ئه‌م ئاسن و گڵ و ئاو و خه‌ڵووز و مس و زێڕ و زیوانه هه‌ڵده‌گرێت و، پارچه‌یه‌ك گۆشتیان لـێ پێك ده‌هێنێت[٢]!

ئه‌ی هاوڕێی بێ‌ئاگام! ئـه‌م كارانـه ته‌نـها تایبه‌تن بـه كه‌سێكه‌وه كه جڵه‌وی ئه‌م وڵاته‌ی به‌ده‌سـته و هیـچ شـتێكی لـێ ون نـابێت و، سـه‌رجه‌می شـتانی نـاو وڵاتیـش ملكـه‌چ و فه‌رمانبه‌رداری ویستی ئه‌ون.

**□ به‌ڵگه‌ی سێهه‌م:**

وه‌ره بـا سـه‌یری دروسـتكراوه سه‌رسـووڕهێن و بزۆكـه‌كانی ئـه‌و بكـه‌ین[٣]. ئـه‌وه‌تا هه‌ریه‌كه‌یان به جۆرێك دروست كراوه كه ده‌ڵێی نوسخه‌یه‌كی پوخت و بچووك كراوه‌ی ئه‌م كۆشكه مه‌زنه‌ی به‌رچاومانه. چونكه هه‌رچی لـه سـه‌رجه‌می كۆشـكه‌كه‌دا هه‌یـه لـه‌م نوسخه پوخته‌یه‌شدا هه‌یه. جا ئایا ده‌گونجێ جگه له بنیاتنه‌ر و دروسـتكه‌ر و داهێنـه‌ری ئه‌م كۆشكه كه‌سێكی تر هه‌بێ بتوانێت ئه‌و كۆشكه مـه‌زن و زه‌به‌لاحـه بـه بچووكـی و پوختـی لـه ئامێر و مه‌كینه‌یـه‌كی ئاوه‌هـا ورددا جێ بكاتـه‌وه؟ ئایـا ده‌گونجـێ "بێ‌مه‌به‌سـتی" و "ڕێكـه‌وت" لـه جیهانێكدا ببینیت كه له مه‌كینه‌یه‌كی بچووكدا جێی كرابێته‌وه؟

واته هه‌موو یه‌كێك لـه‌و مه‌كینانـه‌ی ده‌یـانبینیت، وه‌ك نیشـانه‌یه‌ك وان كـه به‌ڵگـه‌ن لـه‌سـه‌ر دروستكـه‌ر و داهێنـه‌ری ناوازه‌یان، ته‌نانه‌ت هه‌موو یه‌كێك له‌و مه‌كینانه به‌ڵگـه‌ن لـه‌سـه‌ر: ئه‌و دروستكه‌ره و، "بوون"ی ئه‌و ڕاده‌گه‌یه‌نن و، به زمانی حاڵ ده‌ڵێن:

---

(١) ئاماژه‌یه بۆ تۆوه جۆراوجۆره‌كان. ئه‌وه‌تا تـۆوی كاڵـه‌ك وقـۆخ و هاوچه‌شنیان چه‌ند گه‌ڵایه‌كی وا ده‌چنن كه گه‌ڵـێ لـه پارچه و كوتـاڵی جل و به‌رگ جوانتر و نایابتـرن و، لـه گه‌نجینـه‌ی میـهره‌بانیی خواوه‌ندیشـه‌وه چه‌ند به‌روبوومێكمان پێشكه‌ش ده‌كه‌ن كه له حه‌ڵوا و شیرینی‌یه‌كان گه‌ڵـێ به‌تام و به‌له‌زه‌تترن. (دانه‌ر)

(٢) ئاماژه‌یه بۆ به‌دیهێنانی جه‌سته‌ی زینده‌وه‌ران له توخمه‌كان و ئاوی مه‌نی. (دانه‌ر)

(٣) مه‌به‌ست زینده‌وه‌ران و مرۆڤه، چونكه زینده‌وه‌ران پێڕستێكی بچووك كراوه و پوختی ئه‌م جیهانه‌ن و، ماهییـه‌تی مرۆڤیـش نموونه‌یـه‌كی پوختـه‌كراوی بوونه‌وه‌رانه، هـه‌ر شتێك لـه جیـهاندا هـه‌بێت، نموونه‌كه‌شی لـه مرۆڤدا هه‌یـه. (دانه‌ر)

(ئێمە داهێنراوی ئەو کەسەین کە ئەم جیهانەی بە ئاسانی‌یەکی ڕەها داهێناوە، هەروەك ئێمەشی بە ئاسانیی ڕەها بەدی هێناوە).

**☐ بەڵگەی چوارەم:**

ئەی برای سەرسەختم! وەرە با شتێکی لە هەموان سەرسوورهێنەرترت پیشان بدەم! بڕوانە وا هەموو کاروبار و شتێکی ناو ئەم وڵاتە گۆڕانیان بەسەردا دێت، ئەوەتا بە چاوی خۆمان ئەم ئاڵوگۆڕانە دەبینین و هیچ شتێك لەوانەی کە لە بەرچاوماندان لەسەر ڕەوتی خۆیان نامێننەوە و هەموویان بەردەوام لە گۆڕان و نوێ بوونەوەدان.

سەیری ئەم تەنە بێ گیانانە بکە کە لە بەرچاودان و خاوەنی هەست و نەست و دارای ئاگا و شعووریش نین، دەڵێی هەریەکەیان شێوەی فەرمانڕەوایەکی تەواو بەدەستەڵاتیان لەخۆ گرتووە و ئەوانی تریش لە ژێر فەرمان و دەستەڵاتی ئەودان، بە ڕادەیەك کە دەڵێی هەموو یەکێك لەوان بەسەر ئەوانی تردا زاڵ و دەستەڵاتدارە! ئنجا سەیری ئەم مەکینەیەی نزیکی خۆشمان بکە[1] کە دەڵێی فەرمان دەردەکات و گشت پێداویستی‌یەکانی - چ بۆ ئارایشتدانی خۆی و چ بۆ کارەکانی - بە پەلە لە دوورەوە دێن و پێویستی‌یەکانی بۆ ئەنجام دەدەن.. هەروەها سەیری ئەو جەستە بێ هەست و نەستەش بکە[2] کە دەڵێی بە یەك ئاماژەی پەنهانی خۆی مەزنترین تەن و جەستەی تر لە کاروبارەکانی‌دا دەخاتە کار و دەیانکات بە گوێڕایەڵی فەرمان و ئاماژەکانی خۆی..

ئیتر بۆخۆت شتانی تری ناو وڵات بەم دوو نموونەیە بپێوە و لێك بدەرەوە.

جا ئەگەر کاروباری ئەم وڵاتە بە دەست خاوەنەکەی خۆیەوە نەبێت، کە ئێمە نایبینین، ئەوا دەبێ هەرچی وردەکاری و کەماڵاتی داهێنەرەکەی هەن، تێکڕا بە هی دروستکراوەکان دابنرێن، ئیتر ئەو دروستکراوە چ بەردێك، یان گڵێك، یان زیندەوەرێك، یان مرۆڤێك، یاخود هەرکام لە بوونەوەران بێت!

خۆ ئەگەر ژیریی تۆ بەلایەوە دوور بێت کە داهێنەرێکی تاکی تەنیا خاوەنی ئەم وڵاتە بێت و بەڕێوەی ببات، ئەوا دەبێ ئەم ژیری‌یەت ملیۆنەها ملیۆن - بەڵکو بە ژمارەی

---

(١) ئاماژەیە بۆ ڕووەکە بەردارەکان. چونکە سەدان وردیلە کارگە لە ئەندامە ناسك و نیانەکانیاندا هەڵدەگرن و، گەڵا ناسك و گوڵە ڕەنگینەکان دەچنن و، بەروبووم و میوە گەیشتووەکانیش دەڕەخسێنن و پێشکەشی ئێمەیان دەکەن. درەختی زەبەلاحی سنەوبەر نموونەیەکی ترە، کە تەنانەت لەسەر بەردە ڕەق وتەقەکانی ناو چیاکانیش کارگەکانی خۆیان دامەزراندووە! (دانەر)

(٢) ئاماژەیە بۆ: دانەوێڵە و وردیلە تۆوەکان و گەرای مێروو. ئەوەتا "مێشوولە" گەراکانی خۆی لەسەر گەڵای درەخت دادەنێت و ئەو گەڵایە وەك ڕەحمی دایك و لانکی لێ دێت و، لە خۆراکێکی بەتامی چەشنی هەنگوین پڕ دەبێت. وەك بڵێی ئەم درەختە بێ‌بەرە بەری زیندەوەری گرتبێت! (دانەر)

بوونـەوەران – دروسـتکەری داهێنـەر قبـووڵ بکـات کـە هەریەکـەیان دژ و، هاووێنـە و. بری(بدیل)ی خۆ تێهەڵقورتێنەری کاروباری ئەوانی تر بێت!

کەچی ئەو ڕێسـا وردە ناوازەیەی کـە لـە بەرچاودایە، داخـوازی ئەوەیـە هیـچ شـتێك لـە کاروباری بەدیهێنەریدا خۆی هەڵنەقورتێنێت، چونکە هـەر چەشنە دەسـت تێـوەردان و خۆ هەڵقورتاندنێك – با زۆر کەمیش بێت – لە لایەنی هـەر شـت و هـەر کەسێکەوە ببوایـە و لـە هەر کارێکی ئەم وڵاتەدا ڕووی بدایە، ئەوا بە ڕوونی ئاسـەوارەکانی دەردەکـەوت و ئاشکرا دەبوو. ئەوەتا گەر لە گوندێکدا دوو کوێخا و لە شارێکدا دوو پارێزگار و، لە وڵاتێکدا دوو پادشا هەبن، ئەوا هەموو کاروبار و شـتانی ئەو شوێنە بە تەواوی گرفتاری شێرزی دەبن و بـە چەشنێکی هەڕەمـەکی و بـەرباد ئاوێتـە و تێکەڵوپێکـەڵی یـەکتر دەردەچـن.. جـا ئایـا چـۆن دەگونجێ چـەندەها فەرمانڕەوای لەژمارەبەدەر لـە وڵاتێکـدا بـن کـە لەوپـەڕی ڕێکوپێکـی و ناوازەییدا بێت؟!

▢ **بەڵگەی پێنجەم:**

ئەی هـاوڕێی بەگومـانم! وەرە بـا سـەرنجی نـەخش و نیگارەکـانی ئـەم کۆشـکـە مەزنـە بدەین و، بە وردی بۆ ئارایشتەکانی ئەم شارە ئاوەدانە بڕوانـین و، ڕێسـای نـاوازەی ئـەم وڵاتـە فراوانە ببینین و، بیر لـە سنعەتی پـڕ لـە وردەکـاریی ئـەم جیهانـە بکەینـەوە.. ئـەوەتا دەبینـین کـە ئەگـەر ئـەم نـەخش و نیگارانـە نووسـینی قەڵـەمی خاوەنـە ناوازەکـەی خۆیـان نـەبن، کـە موعجیزات و داهێنانی ئەو سنووریان بۆ نییە و، نووسین و نەخشاندنیان بدرێتە پاڵ "هۆکارە بێ هەستەکان" و "ڕێکەوتی کتوکوێر" و "سروشتی کـەڕولاڵ"، ئـەوا دەبـێ ئـەو کاتـە لـە نێـو هەموو بەرد و گژوگیایەکی ئەم وڵاتەدا وێنەکێشێکی خاوەن ئیعجاز و نووسەرێکی نـاوازەی ئەوتۆ هەبێت کە بتوانێت لەناو یەك دانە پیتدا هەزاران کتێب بنووسێت و، لە دووتوێـی تەنـها یەك نەخش و نیگاریشدا ملیۆنەها کاری وردی ناوازە دابنێت! چونکە هەر بـە چـاوی خـۆت دەبینیت کە ئەو "نەخش"ەی لـەم خشـتەی بەردەمتدایـە[1] هـەموو نـەخش و نیگارەکـانی نـاو کۆشکی تێدا کۆ کراوەتەوە و سەرجەمی یاسا و ڕێسـا و پـلان و پرۆگرامـەکانی شـاری تێـدا دانراوە. واتە هەر تەنها بەدیـهێنانی ئـەم نـەخش و نیگـارە نـاوازە و ڕەنگینانـە، موعجیزەیـەکی مـەزنی کتومـت وەك بەدیـهێنانی خـودی وڵاتەکـە وایـە. چونکـە هـەموو سـنعەتێکی نـاوازە، ئاگانامەیەکی وەهایـە کـە وەسـفەکانی بەدیهێنـەری داهێنکـار و نـاوازەی خـۆی ئاشـکرا

(١) ئاماژەیە بۆ "مرۆڤ" کە بەری درەختی بوونەوەرانە و، پەنجە بۆ "بەر" ڕادەکێشێت کـە پێرست و بەرنامەی درەختەکەی خۆی لە ئامێز گرتووە. چونکە ئـەو شـتانەی کـە قەڵـەمی "قـودرەت"ی خـواوەنـد بـە درێژی لـە کتێبـی مەزنی "جیهان"دا نووسیونی، بە کورتی و پوختی لـە ماهییـەتی مرۆڤیشـدا نووسیونیەتەوە.. هـەروەها ئەوانـەی کـە قەڵەمی "قەدەر" لە درەختدا تۆماری کردوون، لە تۆوە بچووکەکانیشیدا دایناون. (دانەر)

دەکات و، گشت نەخش و نیگارێکی جوانیش مۆرێکی ڕوون و لە بەرچاوە لەو مۆرە زۆر و زەبەندانەی ئەو بەدیهێنەرە ناوازە و داهێنکارە.

جا مادەم هەرگیز ناگونجێ کە هیچ پیتێکی نووسراو بەڵگە نەبێت لەسەر نووسەرەکەی و، هیچ نەخش و نیگارێکیش هەواڵی نەخشەکێشەکەمان پێ ڕانەگەیەنێت.. ئەدی چۆن ئەو پیتە ناوازەیەی کە کتێبێکی مەزنی تێدا نووسراوە، نابێت بە بەڵگە لەسەر نووسەرەکەی و، ئەو نەخش و نیگارانەش نەخشەکێشەکەیان ناناسێنن، کە هەر یەکێکیان هەزاران نەخش و نیگاری وردی تێدا نەخشێنراوە؟! ئایا بەڵگەبوونی ئەم چەشنە پیت و نەخش و نیگارانە لەسەر نووسەر و نەخشەکێشەکەیان ڕوونتر نییە لەچاو بەڵگەبوونیان لەسەر بوونی خۆیان؟!

**□ بەڵگەی شەشەم:**

وەرە ئەی هاوڕێ کەم! با پێکەوە گەشتێك بەناو ئەم دەشتاییە بەرین و ڕاخراوەی بەردەمماندا بکەین[1].. ئا ئەوە چیایەکی بەرزی گەردن کەشە، با بڕۆین پیایدا سەربکەوین، تاکو لەوێ بتوانین بە ئاسانی سەیری هەموو لایەك بکەین و، با چاویلکەی گەورەکەر و دووربین لەگەڵ خۆماندا ببەین، چونکە ئەم وڵاتە هێندە شتی سەیر و سەرسووڕهێن و ڕووداوی ناوازەی وای تێدایە کە بە ئەندێشەی هیچ کەسێکدا نەهاتوون..

سەیری ئەو چیا و دەشتایی و شارە ئاوەدانانە بکە، لە ڕاستیدا کارێکی گەلێ سەرسووڕهێنە کە دەیانبینیت بە جارێ هەموویان دەگۆڕڕێن و لەسەر شێوە و باری پێشوویان نامێنن.. تەنانەت ملیۆنەها کاروباری ئاڵۆز و تێهەڵکێش دەبینیت کە بەوپەڕی ڕێساو ڕێکوپێکییەوە ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت، دەڵێی ملیۆنەها تۆپە کوتاڵ و پارچەی ڕەنگاوڕەنگی نەخشین لە هەموو دەم و کات و ساتێکدا لە بەردەمماندا دەچنرێن.. بە ڕاستی ئەم ئاڵوگۆڕانە گەلێ سەرسووڕهێنەرن.. ئایا ئەو گوڵە خنجیلە و ناسکۆڵانەی کە بە زەردەخەنەوە بۆ ئێمەیان دەڕوانی و ماوەیەك بوو لەگەڵیاندا ڕاهاتبووین و گەلێ دڵمان پێیان دەکرایەوە، ئێستا کوان؟ لە کوێن؟ ئاشکرایە هەموویان ڕۆشتن و، چەندین گوڵی قەشەنگ و ڕەنگینی تریان هاتەجێ کە هەرچەند شێوەیان لەوانی پێشوو جیایە بەڵام هەموویان لە

---

(١) ئاماژەیە بۆ ڕووی زەوی لە دوو وەرزی بەهار و هاویندا، چونکە سەدان هەزار بەدیهێنراوی بەیەکدا ئاڵاو لەو وەرزانەدا بەدی دەهێنرێن و لەسەر لاپەڕەی زەویدا، بێ هەڵە و ناتەواوی، دەنووسرێن و بە ڕێکوپێکیش ئاڵوگۆڕیان پێدەکرێت و، بەم چەشنە هەزاران سفرە و خوانی میوانیی خواوەندی میهرەبان ڕادەخرێن و پاشان هەڵدەگیرێن و، ئنجا جارێکی تر نوێ دەکرێنەوە. بە ڕادەیەك کە دەڵێی هەموو درەختێك شاگردێکە لە خواردنگەیەکدا و، گشت ڕەز و باخ و بێستانێکیش خواردنگەیەکی ئامادەکراوی خواردەمەنییەکانە. (دانەر)

ماهییەتدا هاووێنەی یەكترین. وەك بڵێی ئەم دەشتاییە بەرین و چیا گەردنكەشانەی بەردەممان چەند لاپەڕەیەكی پەرتووكێك بن كە بە بێ هیچ هەڵەیەك و بەوپەڕی ڕێكوپێكی چەندەها كتێب لە هەموو لاپەڕەیەكیدا بنووسرێن و پاشان بكوژێنرێنەوە و ئنجا سەرلەنوێ هی تریان لە جێدا بنووسرێتەوە..

جا ئەی هاوڕێی بەڕێزم! ئایا تۆ پێت وایە ئەم ئاڵوگۆڕانەی كە ئاوا بە ڕێسا و تەرازووكاری بەسەر ئەو بارودۆخانەدا دێن، هەڕەمەكی بن و لە خۆڕا ڕوو بدەن؟ ئایا كاری وا لە هەموو مەحاڵێك مەحاڵتر نییە؟

هەرگیز ناگونجێ ڕوودانی ئەم ئاڵوگۆڕانەی بەردەممان كە بەوپەڕی سنعەتكاری و وردی ئەنجام دەدرێن، بدرێنە پاڵ خودی ئەو شتانە تاكو خۆیان لە خۆڕا ئەنجامیان بدەن، نەخێر هەرگیز ناگونجێ، چونكە كاری وا مەحاڵێكی ڕوون و ئاشكرایە، بەڵكو ئەو ئاڵوگۆڕانە ئەوەندە بەڵگەیەكی ڕوونن لەسەر دروستكەر و كارسازی ناوازەی خۆیان گەلێ ڕوونتر لەچاو ئەوەی كە بەڵگەی بوونی خۆیانن! چونكە ئەو ئاڵوگۆڕانە بۆمان دەردەخەن كە دروستكەر و بەدیهێنەریان هیچ كارێكی بەلاوە قورس و گران نییە، نووسینی هەزاران كتێبی وەك نووسینی تەنها یەك پیت بێ ئاسانە.

پاشان - برام! - سەرنج لە هەموو لایەك بدە. دەبینی بەدیهێنەری مەزن بە "دانایی"یەكی تەواو هەموو شتێكی لە جێی شیاوی خۆیدا داناوە و، ئنجا بە لوتف و چاكەی فراوان و گشتیی خۆیشی، نیعمەت و بەخشایشەكانی خۆی بە هەموو شتێك داوە و، پاشان هەروەك دەرگای نیعمەت و بەخششە فراوانەكانی خۆی لە بەردەم هەموو شتێكدا كردووەتەوە، بە هەمان جۆر پێداویستی و حەز و ئارەزووەكانی هەموو شتێكیشی دابین كردووە و، هەر شتێك مایەی دڵنیایی هەر بەدیهێنراوێك بێت، ئەو بەدیهێنەرە مەزنە بۆی دەنێرێت و شادی دەكات پێی.

لە هەمان كاتیشدا چەندین سفرە و خوانی ڕازاوەی پڕ لە بەخشش بۆ گشت بەدیهێنراوانی ڕادەخات، تەنانەت چەندەها نیعمەتی لەسنوور بەدەر بە بوونەوەرانی زیندەوەر و ڕووەكی ئەم وڵاتە دەبەخشێت، بەڵكو لەوەش زیاتر، ئەوەتا نیعمەتی لەبار و شیاوی هەموو یەكێك هەر بە ناو و شێوەی خۆی و بێ هیچ هەڵە و لەبیرچوونێك. دەنێرێت و بە دەستی دەگەیەنێت.

جا ئایا مەحاڵێ لەوە مەزنتر هەیە كە پێت وابێت "ڕێكەوت" - با بە ئەندازەیەكی گەلێ بچووك و كەمیش بێ - دەستی لەم كارانەدا هەبێت؟.. یان هەندێ بێمەبەستی و هەڕەمەكێتی ئاوێتەیان ببێت؟.. یاخود جگە لە بەدیهێنەری ناوازەی خۆیان كەسێكی تر

خۆی لە کاروباری ولاٌتدا هەلٌقورتاندبێت؟.. یان تەسەووری ئەوە بکرێت کە سەرجەمی شتانی ناو ولاٌت ملکەچی ئەو نەبن؟

کاکی هاوڕێم! ئایا دەتوانیت هیچ پەلٌپ و بەهانەیەك بۆ ئینکاری کردنی ئەمانەی دەیانبینیت، بدۆزیتەوە؟!

**☐ بەلٌگەی حەوتەم:**

ئەی هاوڕێی بەڕێزم! با واز لە شتانی هەندەکی(جزئي) بهێنین و، سەرنج لەم جیهانە سەرسووڕهێنە بدەین و، هەموو بارودۆخێکی گشت بەشە بەرامبەر یەکەکانیان ببینین.. چونکە ئەم جیهانە ناوازەیە هێندە ڕێسای گشتی و هەمەلایەنە و ڕێکوپێکیی تەواوی تێدایە کە دەلٌێی هەموو شتێکی ناوی: بکەر و، زیندوو و، دارای ئیختیارە و، سەرپەرشتیکاری ڕێسای سەرجەمی ولاٌتە بەگشتی و، جموجوولٌەکانیشی لەگەلٌ ڕێسای گشتیدا هێندە تەبا و گونجاون، کە تەنانەت ئەو شتانەش بە ڕواڵەت وا دەنوێنن لە یەکترەوە دوور بن، لە ڕاستیدا یەکبەیەکیان بۆ هاوکاری و پشتگیریی یەکتر هەولٌ دەدەن و تێدەکۆشن.

بڕوانە! وا کاروانێکی بەسام و شکۆ لە جیهانی پەنهانی غەیبەوە ڕووەو ئێمە بەڕێوەیە و دەفری پڕ لە ڕۆزیی زیندەوەرانی پێیە[1].. پاشان سەیری ئەو چرا ڕووناکیبەخشە بکە[2] کە بە گومەزی ئاسماندا هەلٌواسراوە و ڕووناکی بە هەموان دەبەخشێت و ئەو خۆراکانەش پێدەگەیەنێت کە بە دەزوولەیەکی باریك[3] هەلٌواسراون و بە دەستێکی پەنهان ڕووبەڕووی ئەو چرایە ڕاگیراون.

ئایا لەگەلٌ مندا ئاوڕێك لەم زیندەوەرە دەستەوسان و لەڕ و لاوازانە نادەیتەوە کە بەهۆی ترومپایەکی هەلٌواسراو لە ئاستی سەریاندا[4] خۆراکێکی پوخت و خاوێن بەرەو دەمیان ڕەوانەکراوە و تەنها ئەوەندە ئەرك دەکەوێتە ئەستۆیانەوە کە دەم لەو ترومپایانە بدەن تاکو ئەو خۆراکەیان پێ بگات؟

لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

هەرچی کەرەسە و شتی ناو جیهان هەیە لە بارودۆخ و شێوەیەکی وادایە کە دەلٌێی ڕووەو ئەوانی تر دەڕوانێت و بەهانایانەوە دەڕوات، یان دەلٌێی چاوی لەوی ترە و پشتی دەگرێت و هاوکاریی لەگەلٌدا دەکات. کەواتە هەموو یەکێك لە بوونەوەرانی ناو ئەم جیهانە، تەواوکەر و پشتگیری ئەوانی ترە و، شان بە شانی یەکتر ڕووەو ئامانجی گشتی بە ڕێی ژیاندا

---

(١) مەبەست کاروانی ڕووەکەکانە، کە ڕۆزیی سەرجەمی زیندەوەرانیان لەگەلٌ خۆدا هەلٌگرتووە. (دانەر)

(٢) ئاماژەیە بۆ خۆر. (دانەر)

(٣) ئاماژەیە بۆ لق و پەلە نەرمونیانەکانی درەخت کە بەروبوومە بەتامولەزەتەکان هەلٌدەگرن. (دانەر)

(٤) ئاماژەیە بۆ مەمك و گوانی دایکانی مرۆڤ و زیندەوەرانی تر. (دانەر)

دەڕۆن. بۆ خۆت ئەمە بکە بە نموونەیەك و شتانی تری ناو ئەم جیهانەی پێ لێك بدەرەوە.

جا ئەم دیاردانە، بە جۆرێکی گومانبڕ و بە دڵنیایی تەواو، ڕێنماییمان دەکەن بۆ ئەوەی کە: هەرچی شتی ناو ئەم کۆشکە سەرسووڕهێنەرە هەیە، گوێڕایەڵ و ملکەچی خاوەنە بەتوانا و دروستکەرە ناوازەکەی خۆیەتی و، بە ناوی ئەو خاوەنەی و لە پێناوی ئەودا کار دەکەن، تەنانەت هەموو شتێکی ناو ئەم جیهانە وەك سەربازێکی ئامادە و گوێڕایەڵی چاوەڕێی فەرمان وایە، چونکە هەموو شتێك بەهۆی هێز و توانای خاوەنەکەیەوە سەرجەمی ئەو ئەرك و کارانە ڕادەپەڕێنێت کە پێی سپێرراون، ئەوەتا بە فەرمانی ئەو دەجووڵێتەوە و.. بەپێی دانایی ئەو کارەکانی ڕێك دەخات و.. بە فەزڵ و بەخشایشی ئەویش هاوکاری لەگەڵ شتانی دەوروبەری خۆیدا دەکات و.. هەر بە میهرەبانیی ئەویش فریای شتان و کەسانی تر دەکەوێت.

جا ئەی برای بەڕێزم! ئەگەر دەتوانیت هەر جۆرە ڕەخنە و پەڵپ و بەهانە و گومانێك لەم بەڵگەیەدا بدۆزیتەوە، فەرموو بیخەرە ڕوو!

**▢ بەڵگەی هەشتەم:**

وەرە ئەی ئەو هاوڕێیەم کە چەشنی دەروونی بەدخوازم وایە و خۆی بە ژیر و تێگەیشتوو لە قەڵەم دەدات و گومانی باشی بە خۆی هەیە!

کاکی هاوڕێم! دەتبینم حەزت لە ناسینی خاوەنی ئەم کۆشکە ناوازەیە نییە، کە لە ڕاستیدا هەموو شتێك بەڵگەیە لەسەری و ئاماژەی بۆ دەکات و شایەتی لەسەر بوونی دەدات. تۆ چۆن پرکێشیی بەدرۆخستنەوەی ئەم گشت شایەتییانە دەکەیت؟ خۆ گەر بتەوێ ئەو هەموو شایەتییانە بەدرۆبخەیتەوە، ئەوا دەبێ ئینکاریی "بوون"ی خودی کۆشکەکەش بکەیت، تەنانەت دەبێ ڕایبگەیەنیت کە: نە کۆشك و نە وڵات و نە هیچ شتێك، دارای "بوون" نییە! بەڵکو دەبێ ئینکاریی خۆیشت بکەیت و بە "نەبوو" لە قەڵەمی بدەیت! یان دەبێ بۆ لای فام و ژیریی خۆت بگەڕێیتەوە و بە باشی گوێ لە من ڕابگریت. وا ئێستا من ئەم دیمەنەت پێش چاو دەخەم:

سەرنج لەم تۆخمانە بدە[1] کە لە هەموو لایەکی ئەم وڵاتەدا هەن و لە گشت شوێنێکی ئەم کۆشکەدا دەست دەکەون، ئاشکرایشە کە هەر شتێك لەم وڵاتەدا بەرهەم دەهێنرێت،

---

(١) ئاماژەیە بۆ تۆخمی "هەوا" و "ئاو" کە چەندین فەرمانبەری و کارمەندیی جۆراوجۆر ئەنجام دەدەن و، بە ئیزن و ڕوخسەتی خوای گەورە یارمەتیی هەموو موحتاجێك دەدەن و، فریای دەکەون و، لە گشت جێیەکدا بە فەرمانی خوای گەورە بڵاو دەبنەوە و، پێداویستییەکانی زیندەوەران ئامادە و دابین دەکەن و، بناغەی سەرەکیی دەزووی نەخش و نیگارەکانی دروستکراوانی خوای گەورەن. (دانەر)

هەموویان لەو مادده و توخمانە دروست دەكرێن. كەواتــە ئەو كەسەی خاوەنی ئەو توخـم و ماددانە بێت هەر ئەو خاوەنی سـەرجەمی ئەو شتانەشە كە لـەم وڵات و كۆشـكەدا دروست دەكرێـن و بەرهـەم دەهێـنرێن. چونكـە هەر كەسێك خـاوەنی كێڵگەیـەك بێـت دیـارە خـاوەنی داهاتەكانیشیەتی و، گەر كەسێكیش خاوەنی دەریایەك بێت هەموو شتانی ناو دەریاكەش هی ئەو دەبن.

پاشان – ئـەی هاورێكـەم! – سـەیری ئەم پارچـە و كووتاڵـە چنراوە ڕەنگـاوڕەنگ و بـە گوڵزار ئارایشت دراوانە بكە، ئەوەتا هەموویان لە یەك مادده دروست دەكرێـن. كەواتـە ئـەو كەسەی ماددەكەی ئامادە كردووە و ڕستوویەتی دەبێ یـەك كـەس بێـت، چونكـە ئـەو سنعەتە هەرگیز بوار نادات چەند دەستێك لـە دروستكردنیدا هاوبـەش بووبن. كەواتـە ئـەو كووتاڵـە چنراوانە تایبەتن بەو یەك كەسە تاك و تەنیایەوە.

پاشان ئاورێك لەمە بدەرەوە كە دەبینیت: نەژاد و ڕەگەزەكانی ئەم كووتاڵـە چنراوانـە لـە هەموو جێگایەكی ئەم جیهانە سەرسوورهێنەرەدا هەن و لە گشت شوێنێكدا پەرش و بـڵاون، بە ڕادەیەك كە هـەر هـەموویان پێكـەوە و بـە جۆرێكـی تێهـەڵكێش و لـە یـەك كـاتدا و بـە یـەك چەشن لە هەموو جێیەكدا دەچنرێن و ئامادە دەكرێن. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە كە: سەرجەمی ئەوانـە كـرداری یـەك كەسـی بكـەری تـاك و تەنیایـە. ئەوەتا هـەر هـەموویان بـە فـەرمانی یـەك فەرمـاندە دەجـووڵێنەوە. دەنا گەر وا نەبێ، ئەوا كارێكی یـەكجار ئەستەم دەبێـت كـە تـەبایی تەواوەتی و یەككەوتنی ئـاوا ڕوون و ئاشـكرا لـە یـەك كـاتدا و بـە یـەك چەشــن و چۆنێتـی و شێوە لە هەموو جێیەكدا ڕووبدات. لەبەر ئەمانە، هـەر شتێك لـەم جیـهان و كۆشـكەدا بـە وردی و ڕێكوپێكی دروست كرابێت، دەبێت بە بەڵگەیەكی ڕوون لەسەر بوونی ئەو بكـەر و دروستكەرەی كـە ئێمـە نـابینین، بەڵكو بـە ئاشكرا و ڕاشكاوی بوونـی ئـەو ڕادەگەیـەنێت، تەنانـەت هـەموو پارچـە كووتـاڵێكی چـنراوی بـە گـوڵ نەخشـێنراو، هـەروەها گشـــت مەكینەیـەكی نـاوازە و هـەموو خۆراكێكی بـەتام – لـە ڕاسـتیدا – نیشـانە و مۆر و بەڵگـە و تەمغەی دروستكەر و بەدیهێنەرە موعجیزەكارەكەیەتی و، هەریەكەیان بە زمانی حاڵ دەڵێن:

(ئەو كەسەی منی دروست كردووە، هەر ئەو خاوەنی ئەو جێگایەشە كە منی تێدام).

هەموو نەخش و نیگارێكیش دەڵێت :

(ئەو كەسەی منی چنیوە و نەخشـاندوومی، هـەر تەنـها ئـەو كەسـە ئـەو تۆپـە كووتاڵەشـی چنیوە كە من بەشێكم لێی).

هەموو پارووەیەك خۆراكی بەلەزەتیش دەڵێت :

(ئەو كەسەی دروستم دەكات و پێمدەگەیـەنێت، هـەر ئـەو خـاوەنی ئـەو مەنجەڵەیشـە كـە منی تێدا دەكوڵێنێت).

گشت ئامێرێكیش ده‌ڵێت :

(ئه‌و كه‌سه‌ی منی دروست كردووه‌، هه‌ر ئه‌و خاوه‌نی سه‌رجه‌می هاووێنه‌كانی منیشه‌ له‌ هه‌موو جیهاندا، واته‌ ته‌نها ئه‌و كه‌سه‌ ده‌توانێت خاوه‌نی ئێمه‌ بێت كه‌ خاوه‌نی ئه‌م وڵات و كۆشكه‌یه‌).

هه‌موو ئه‌مانه‌ش به‌ وێنه‌ی ئه‌وه‌ی كه‌ هه‌ر كه‌سێك لافی خاوه‌نێتیی قۆپچه‌كانی به‌رگی سه‌ربازی و دانانی دروشمی ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ریان، لێ بدات، ده‌بێ خاوه‌نی ڕاسته‌قینه‌ی سه‌رجه‌می كارگه‌كانی ئه‌و قۆپچه‌ سه‌ربازی‌یه‌ دروشم له‌سه‌رنه‌خشاوانه‌ بێت، ده‌نا لاف لێدانێكی درۆینه‌ ده‌رده‌چێت و له‌سه‌ر ئه‌و ڕه‌فتار و گوفتاره‌ی ڕووبه‌ڕووی سزا ده‌بێته‌وه‌.

**پوخته‌ی ئه‌م قسانه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌:**

هه‌روه‌ك توخمه‌كانی ناو ئه‌م وڵاته‌ له‌ هه‌موو سووچ و شوێنێكی وڵاتدا په‌رش و بڵاون و، ئه‌مه‌ش ده‌بێت به‌ به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌ی كه‌ خاوه‌نی هه‌موویان یه‌كێكه‌ و سه‌رجه‌می شتانی ناو وڵات موڵكی ئه‌ون.. به‌ هه‌مان جۆر، دروستكراوانی زۆر و زه‌به‌نده‌ و په‌رش و بڵاوی گشت لایه‌كی وڵاتیش (له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له‌ یه‌ك ده‌چن و یه‌ك نیشانه‌ و یه‌ك یاسا له‌ دروست بوونیاندا ده‌رده‌كه‌وێت) هه‌موویان به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ ته‌نها یه‌ك كه‌س هه‌یه‌ به‌سه‌ریاندا زاڵه‌ و هه‌موویان دروست ده‌كات.

كاكی هاوڕێم! له‌م جیهانه‌دا نیشانه‌ی "یه‌كتایی" گه‌لێ ڕوونه‌ و به‌ڵگه‌ی "ته‌وحید"یش یه‌كجار ئاشكرایه‌، چونكه‌ هه‌ندێ شت هه‌ن هه‌رچه‌ند یه‌كێكن، كه‌چی له‌ هه‌موو جێیه‌كی جیهاندا هه‌ن.. به‌شێكی تری شتانیش وێڕای جۆراوجۆری و جیاوازیی شكڵ و شێوه‌یان، كه‌چی له‌گه‌ڵ هاووێنه‌كانیشیاندا - به‌هۆی له‌یه‌كچوونیان و بڵاوبوونیان له‌ هه‌موو جێیه‌كدا - هاوجۆری(وحدة نوعیة)یه‌ك پێكده‌هێنن.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی "یه‌كبوون" له‌ شتاندا - وه‌ك ئاشكرایه‌ - به‌ڵگه‌ی یه‌كبوونی دروستكه‌ریانه‌، ئه‌وا ده‌بێ دروستكه‌ر و خاوه‌نی هه‌موو ئه‌و شتانه‌ یه‌كێكی تاك و ته‌نیا بێت.

ئنجا وێڕای ئه‌مانه‌ش، به‌ چاوی خۆت ده‌بینیت كه‌ چه‌ندین دیاریی به‌نرخمان له‌ پشتی په‌رده‌ی غه‌یبه‌وه‌ پێشكه‌ش ده‌كرێت و، چه‌نده‌ها په‌ت و تاڵه‌ ده‌زوویش(1) له‌ پشتی ئه‌و په‌رده‌ په‌نهانه‌وه‌ شۆڕ ده‌بنه‌وه‌ كه‌ چه‌ندین نیعمه‌ت و چاكه‌ و به‌خشایشی له‌ ئه‌ڵماس و زومڕووت به‌نرختریان پێدا هه‌ڵواسراون.

---

(١) په‌ته‌كان ئاماژه‌ن بۆ دره‌ختی به‌ردار و، ده‌زووه‌كان بۆ په‌ل و لقه‌كانی و، دیاری و به‌خشایشه‌ ڕازاوه‌كانیش بۆ جۆره‌كانی گوڵ و به‌روبوومه‌كان. (دانه‌ر)

کەواتە بۆخۆت گێژی و گەلحۆیی ئەو مرۆڤە هەڵبسەنگێنە کە ئەو کەسە ناناسێت وا ئەم هەموو کاروبارە سەرسووڕهێنانە بەڕێوەدەبات و ئەم گشت دیاری‌یە ناوازانەش پێشکەش دەکات! هەروەها مەودای بەدبەختیی ئەو کەسەش لێك بدەرەوە کە شوکرانەبژێریی ئەو نیعمەتانە ئەنجام نادات! چونکە ئەو جۆرە مرۆڤە نەفامی و نەزانی‌یەکەی دەیگەیەنێتە ئەو ڕادەیەی کە چەند وتەیەکی وڕێنەئاسای لە زار دەربچێت و - بۆ نموونە - بڵێت: ئەو مرواری‌یە ڕازاوانە هەرخۆیان خۆیانیان دروست کردووە! واتە نەزانی‌یەکەی لە ڕادەیەکی ئەوتۆدایە کە ئەو مرۆڤە ڕاپێچ دەکات بۆ ئەوەی: واتا و ناوەرۆکی "پادشا" بە هەموو یەکێك لەو پەت و دەزووە شۆڕەوەبووانە ببەخشێت! کەچی ئێمە دەبینین لە ڕاستی‌دا دەستێکی غەیبیی پەنهان بۆ ئەو پەتانە ڕادەکێشرێت و دروستیان دەکات و دیاری‌یەکانیشیان پێدا هەڵدەواسێت. واتە هەرچی شت لەناو ئەم کۆشکەدا هەیە، چەندە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر "بوون"ی خۆی، ئەوەندە زیاتریش بەڵگەیە لەسەر بوونی داهێنەرە ناوازەکەی.

جا ئەی کاکی هاوڕێم! گەر تۆ ئەو داهێنەرە ناوازەیە بە تەواوی و ڕاستی نەناسیت، ئەوا دەکەویتە پلەیەکی گەلێ نزمتر لە هی ئاژەڵان، چونکە ئەو کاتە ناچاری ئینکاری کردنی "بوون"ی ئەم هەموو شتانەی ناو کۆشك و وڵات دەبیت!

**□ بەڵگەی نۆهەم:**

ئەی ئەو هاوڕێیەی کە بڕیارەکانی بە هەڕەمەکی دەردەکات!

تۆ نە خاوەنی ئەم کۆشکە دەناسیت و نە حەزیشت لە ناسینی هەیە، چونکە بە دووری دەزانیت خاوەنێکی هەبێت و، ئنجا لەبەر ئەوەش کە "ژیری"ت سەبارەت بە پەی بردنی بەم موعجیزاتە ڕوون و کارە ناوازە و ڕەنگینانە دەستەوسان ماوە، ئەوا ڕێی ئینکاری کردنی حاڵەتەکانی خاوەنی کۆشکت گرتووەتەبەر، کەچی لە ڕاستی‌دا دووریی ڕاستەقینە و گیروگرفتی دژوار و کێشەی قورس و زۆر و زەبەندە - بەپێی لێکۆڵینەوەی ژیریی مرۆڤ - تەنها لە: نەناسینی خاوەنی ئەم کۆشکەدایە. چونکە نەناسینی ئەو، لە ئەنجامدا ناچاری ئینکاری کردنی سەرجەمی ئەم ماددە و کەرەسە زەبەندانەی بەرچاومانت دەکات، کە بە نرخێکی هەرزان و زۆری‌یەکی لەڕادەبەدەر بۆت ئامادە کراون..

بەڵام گەر ئێمە ئەو خاوەن کۆشکە بناسین، قبووڵ کردن و سەلماندنی بوونی شتانی ناو کۆشك و سەرجەمی ئەم جیهانە، دەبێت بە کارێکی تابڵێی ئاسان و، لەگەڵ ژیریی مرۆڤدا گونجاو دەردەچێت، بە ڕادەیەك کە دەڵێی هەموو شتانی ناو کۆشك یەك شتن. چونکە گەر ئەو نەبێت و نەیناسین ئەوا دەستکەوتنی هەموو شتێك دەبێتە کارێکی سەخت و لەڕادەبەدەر قورس و گران، بگرە ئەگەر ئەو نەبێت، هیچ‌کام لەو شتانە نابینیت کە ئێستا لە بەرچاوتدا بە

زۆری دانراون! گەر حەز دەكەیت ئەمەت بە تەواوی بۆ ڕوون ببێتەوە، ئـەوا فـەرموو سـەیری ئەو قوتووە مورەبایانە بكە كە لەم دەزوولـەیەوە شۆڕبوونەتەوە[1] چونكە ئەوانە گەر بەرهـەمی خانەی كولاّندنی سەر بەو توانستە موعجیزەكارە نـەبن، هـەرگیز نـەتدەتوانی - تەنانـەت بـە نرخێكی تابلێیی گرانیش - هیچ كامیانت دەست بكەوێت!

بەڵێ، دووری و گێروگرفت و قورسی و تیاچوون و كاری مەحاڵ، تەنها لەوەدایە كە ئەو نەناسرێت. چونكـە گـەر - بۆ نموونـە - یەكبەیـەكی بـەرەكانی درەختێـك پەیوەستەی چـەند مەڵبەندێكی جیا جیا و پابەندی چەندین یاسای جۆراوجۆر بن، ئەوا بەدیهێنانی تەنها یەك دانە "بەر" بە ئەندازەی خودی درەختەكە قورس و پڕ لە كێشـە و گـێروگرفت دەبێـت، بـەلاّم گـەر بەدیهێنانی "بەری درەخت" بەپێی یـەك یاسـا و لـە یـەك سـەرچاوەوە بێـت، بـەلای ژێری‌یـەوە، بەدیهێنانی هەزار دانە "بەر" - ئەو كاتە - بە ئەندازەی یەك دانە "بەر" ئاسان دەبێت! كتومـت چەشنی دابین كردنی كەرەسە و تەقەمەنی‌یەكانی سوپا، كە هـەركات لـە یـەك سـەرچاوە و بـە یـەك یاسـا و لـە یـەك كارگـەوە ئـەنجام بدرێـت، بـەلای ژێری‌یـەوە كـارێكی ئاسـان و گونجـاو دەبێـت، بـەلاّم گـەر هـەموو یـەكێكی سـەربازەكانی سـوپا بـە یاسـایەكی تایبـەتی‌و لـە سەرچاوەیەكی جیاواز و كارگەیەكی تایبەت بەو سـەربازەوە كەرەسـە و تەقەمەنی‌یـەكانی بـۆ ئامادە و دابین بكرێت، بە تەواوی كارەكە سەخت و پڕ لە كێشە دەبێت، بگرە ئەو كاتە تەنـها یـەك سـەرباز بـە ئـەندازەی ژمـارەی كەسـانی سـوپایەكی تـەواو، پێویستی بـە: كارگـەی تەقەمەنی و، مەڵبەندی دابین كردنی كەرەسە و شمەك و، یاسای زۆری جۆراوجۆر دەبێت!

هـەر بـە وێنـەی ئـەم دوو نموونەیە، بەدیـهێنانی شـتانی نـاو ئـەم كـۆشـكە مـەزن و، شـارە ڕەنگین و، ولاّتە پێشكەوتوو و، جیهانە بەسـام و شـكۆیەش، گـەر بدرێتـە پـاڵ یـەكێكی تـاكی تەنیا، ئەوا بەلای ژێری‌یەوە بەدیهێنانیان گەلـێ ڕوون و ئاسـان و بێ گـێروگرفت دەبێـت، بـە ڕادەیەك كە ئەم زۆری‌یەی لە بەدیهێنانی شتاندا دەیبینیت جگە لە كاری ئـەو تـاك و تەنیایـە بـە هیچ شتێكی تر لێك نادرێتەوە!

بەلاّم گەر ئەم كارە بە هی ئەو كەسە تاك و تەنیایـە دانـەنرێت، بەدیـهێنانی تەنـها یـەك شـت هێندە كارێكی دژوار دەبێت كە ئەگەر سەرجەمی دنیاشـی لـە پێنـاودا خـەرج بكـەیت هێشـتا هەر ناگونجێ ئەو تەنها پێویستی‌یەت بۆ بەدی بهێنرێت.

---

(١) قوتووی مورەبا، ئاماژەیە بۆ: كالەك و شەمامە و هەنار و هاوچەشنیان لە قوتووەكانی تری توانستی خوایی، كـە هەر هەموویان دیاریی میهرەبانیی خوای گەورەن. (دانەر)

**▢ بەڵگەی دەهەم:**

کاکی هاوڕێم! ئەی ئەو کەسەی وردە وردە لە ویژدانەوە نزیك دەبێتەوە!

وا ماوەی پازدە ڕۆژە[1] ئێمە لێرەداین، جا ئەگەر هێشتا پاش ئەم ماوەیە ڕێسا و یاساکانی ئێرە شارەزا نەبین و پادشا و خاوەنەکەشی نەناسین، شایانی ڕووبەڕووبوونەوەی سزا دەبین. چونکە لەمەولا بواری بەهانە و بیانوومان نادرێت و، تەنها بۆ ماوەی ئەم پازدە ڕۆژە بوو کە مۆڵەت درابووین و دەستیان نەدەهێنایە ڕێمان. دەبێ بە بێ گومانی ئەوەش بزانین کە ئێمە لێرەدا بە تەواوی لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتماندا سەربەست نین، چونکە بەدیهاتووە پڕ لە وردەکاری‌یەکانی ئەم وڵاتەی کە ئێمەی تێداین هێندە وردی و نەرمونیانی‌و دەرس و پەندیان تێدایە کە مەزنیی پادشا و خاوەنەکەیان دەردەخەن، کەواتە سزا و تۆڵەسەندنەکانیش دەبێ گەلێ توند و تیژ و سەخت بن. بۆ خۆت دەتوانیت مەزنی و توانستی خاوەنی وڵات لەمەوە تێ بگەیت:

ئەو پادشا و خاوەنەی کە لێی دەدوێین، هەردەم بە ئەندازەی ئاسانیی ڕێکخستنی کۆشکێکی بەرز، ئەم جیهانە مەزنەش ڕێکدەخات و.. بە قەدەر سانایی بەڕێوەبردنی ماڵێکی بچووك، کاروباری ئەم جیهانە سەرسووڕهێنەرەش بەڕێوە دەبات و.. چەشنی ئاسانیی پڕ کردن و خاڵی کردنەوەی دەفرێك، ئەم شارە ئاوەدانەش بەوپەڕی ڕێکی و تەواوی و دوور لە نوقسانی و بە دانایی‌یەکی تەواو، لە "دانیشتووان" پڕ دەکات و پاشان خاڵیشی دەکاتەوە و.. بە ئەندازەی ئاسانیی ڕاخستن و هەڵگرتنەوەی سفرە ئاسایی‌یەکانی خواردن و بە کەماڵی کەرەم و دەستی پەنهانی خۆیشی، لەم سەر و ئەو سەری جیهاندا سفرە و خوانی مەزن و ڕەنگاوڕەنگ[2] ڕادەخات و چەندین جۆر خۆراکی بەتام و چێژی لەسەر ئامادە دەکات و، پاشان ئەو سفرانە هەڵدەگرێتەوە و دەیانپێچێتەوە.. جا ئەگەر تۆ مرۆڤێکی وریا و زرنگ بیت، تێ دەگەیت کە ئەم هەموو مەزنی و سام و شکۆیە: بەخشندەیی و سەخاوەتێکی نەبڕاوەبەدەر و بێ‌سنوور دەردەخەن.

پاشان بڕوانە:

هەروەك ئەم شتانە شایەتی ڕاستگۆن لەسەر: مەزنی و زاڵبوون و، دەستەڵاتداری و پادشایی و تاك و تەنیایی خاوەنە بەتوانا و دەستەڵاتەکەی ئەم کۆشك و شارو وڵاتە، بە هەمان

---

[1] ئاماژەیە بۆ تەمەنی "تەکلیف" کە پازدە سالی‌یە. (دانەر)

[2] ئاماژەیە بۆ گۆڕی زەوی لە بەهار و هاویندا. چونکە لەو دوو وەرزەدا چەندین خواردەمەنیی بەتام و چێژی جۆر وجۆر لە خانەی خۆراك کوڵاندنی خواوەندەوە دەردەچن و، سفرە و خوانی نیعمەتە ڕەنگاوڕەنگ و جیاوازەکان ڕادەخرێن و بە بەردەوامیش نوێ دەکرێنەوە. ئنجا هەموو باخ و بێستانێك خواردنگەیەکە بۆ پێگەیاندنی ئەو نیعمەتانە و، گشت درەختێکیش خزمەتگوزارێکی خواردنگەکەیە! (دانەر)

جۆر كاروانـە يـەك لـە دواى يـەك هاتووەكـان و ئـالۆگۆڕە وەك يەكـەكانيش بەڵگـەن لەسـەر بەردەوامى و مانەوەى ئەو پادشايە. چونكە سەرجەمى شتانى فانى و لـەناوچووى ئەم وڵاتـە، هـاودەم لەگـەڵ نـەمانى خۆيـاندا، هۆكارەكـانى بوونيشيان دەڕۆن و نـامێنن و تێكـڕا پێكـەوە تيـادەچن، كـەچى ئـەو بوونـەوەر و شـتانەى كـە دوا بـە دواى ڕۆشـتووان و كـۆچ كردووانـى پێشوو دێن، هەموويان تازە و نوێن و، چەشنى ئەوانەى پێشـوو داراى ئاسـەوارى سـەربەخۆى خۆيانن.

كەواتە هيچ كام لەوانە كارى دەستى ئەو هۆكارانە نين و لـەوانـەوە پـەيدا نـەبوون، بـەڵكو تێكڕا كارى ئەو كەسەن كە هەرگيز نەمانى بەسەردا نايەت! چونكـە هـەروەك بريسـكانەوەى ئـەو كـەف و بڵقـە ئاوانـەى كـە لـە دواى لـەناوچوونى كـەف و بڵقـەكانى پێشـووى جۆگـە ئاوەكانەوە دێن تێماندەگەيەنن كە: بريسكانەوەى ئەمان لـە كـەف و بڵقـە لەناوچووەكانـەوە پەيدا نەبوون، بەڵكو هى سەرچاوەيەكى هەميشە ڕووناكى بەخشن..

هەروەك ئەم بريسكانەوانە ئەمـەمان تێدەگەيـەنن، بـە هـەمان جـۆر گۆڕانـى ئـەو كارانـەى لێرەدا ڕوودەدەن بە خێرايىيەكى سەرسووڕهێن و، پاشان ڕەنگدانەوەى ئـەو كارانـەى دواى خۆيـان بـە هـەمان ڕەنـگ و سـيفەتەكانى پێشـووتر، بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەى ئـەو كارانـە درەوشـانەوەى كەسێكن كـە: هەميشـەيىيە و، لـەناوناچێت و، گۆڕانـى بەسـەردا نايـەت و: سەرجەمى شتانى تريش جگە لە سنعەت و ئاوێنە و نەخشى ئەو، هيچى تر نين!

### ☐ بەڵگەى يازدەهەم:

وەرە ئەى كاكى هاوڕێم! با بەڵگەيەكت پيشان بدەم كە بە ئـەندازەى گشـت بەڵگـەكانى پێشوو بەهێز و پتەوە.. با خۆمان بـۆ گەشـت و گوزارێكـى دەريـايى ئامـادە بكـەين و سـوارى كەشتىيەك ببـين[1].. بـا بڕۆيـن بـۆ دوورگەيـەكى دوور لـە خۆمانـەوە.. دەزانيـت لەبـەر چـى

---

(١) كەشتىيەكە ئاماژە بۆ: "مێژوو" دەكات و، دوورگەكەش ئاماژەيە بۆ: چاكترين سەدە كە سەردەمى بەختەوەريى پێغەمبەرايەتىيە. جا ئەگەر ئەو پۆشاكانەى كە شارستانێتيى نزمى بێنرخ لەبەرى كردووين، لەسەر كەنارى ئەم سەردەمەدا لەبەرمان داماڵين و، خۆمان بهاوينە ناو دەرياى "زەمان" و سوارى كەشتيى "مێـژوو" و "سيرەت" ببين و بگەينە لێوارى دوورگەى سەردەمى نوور و بەختەوەرى و دوورگەى عەرەب و، شـەرەفمەندى بـە خزمەت گەيشـتنى پێغەمبەر ﷺ ببين لە گەرماو گەرمى ئەو كاتەىدا كە ئەركى بێ گـەرد و پيرۆزى پێغەمبەرێتىيەكەى ئەنجام دەدات.. ئەو كاتە، تێدەگەين كە ئەو پێغەمبەرە ﷺ بەڵگەيەكى ڕوون و ئاشكراى تەوحيدە، بە ڕادەيەك كـە سـەرجەمى گـۆى زەوى و هـەردوو ديـوى زەمـانى ڕابـوردوو و ئـايندەى ڕوونـاك كردووەتـەوە و تاريكسـتانى كوفـر و گومڕاييشـى تەفروتوونا كردووە. (دانەر)

بەرەو ئەوێ دەڕۆین؟ چونکە لەوێ کلیلی مەتەڵەکانی جیهان و نهێنی‌یە داخراوە سەیرەکان دەست دەکەون، نابینیت ئەو حەشاماتە چاویان بڕیوەتە ئەوێ و بۆی دەڕوانن و چاوەڕوانی بەیاننامەیەکن کە لەوێ دەردەچێت و هەموویان فەرمانیان لەوێوە بۆ دێت؟..

وا دەستمان بە گەشتەکەمان کرد.. وا گەیشتین و پێمان خستە سەر خاکی دوورگەکە.. بە وردی - هاوڕێی ئازیزم! - بۆ سەرکردەی ئەو کۆبوونەوە بەسام و شکۆیە بڕوانە.. با کەمێك لێی بڕۆینە پێشەوە، تاکو لە نزیکەوە بیناسین. ئەوەتا زیاد لە هەزار دانە مەدالیای[1] بەنرخ و بەرزی بە سنگ و بەرۆکەوەیە و، بە گوفتارێکی یەکجار خۆش و شیرین و پڕ لە متمانە و باوەڕبەخۆبوونەوە، دەدوێت. جا لەبەر ئەوەی من لە ماوەی پازدە ڕۆژی ڕابوردوودا شتێك لە بارەی لێدوانەکەی ئەو شارەزا بووم، وا منیش ئەو وتارەت تێدەگەیەنم:

ئەو سەرکردەیە سەبارەت بە پادشای خاوەن موعجیزاتی ئەم وڵاتەوە دەدوێت و، دەڵێت: (پادشا منی بۆ لای ئێوە ناردووە).

سەیری بکە، ئەوەتا چەندەها کاری دەراسای سەیر و موعجیزاتی ئەوتۆ پیشان دەدات، هیچ گومانێك لەوەدا بۆ مرۆڤ ناهێڵنەوە کە ئەو سەرکردەیە بە تایبەتی لە لایەن ئەو پادشا مەزنەوە ڕەوانە کراوە. بە باشی گوێ لە قسە و گوفتارەکانی ڕابگرە، چونکە هەموو بوونەوەران، تەنانەت سەرجەمی وڵات بە وردی گوێیان لەو ڕاگرتووە و تێدەکۆشن وتارە شیرینەکەی ببیستن و ڕوخساری جوانیشی ببینن.

وا نەزانیت کە هەر تەنها گرۆی "مرۆڤ" گوێیان بۆ وتارەکەی ڕاگرتبێت، نەخێر، بەڵکو هەموو ئاژەڵەکان و گشت چیا و بوونەوەرە بێ گیانەکانیش گوێ لە فەرمانەکانی ڕ دەگرن و لە سام و شکۆ و شەوقی ئەودا تەزوو بە جەستەیاندا دێت.. تەماشای درەختەکان بکە، با بزانیت کە چۆن فەرمانبەردار و ملکەچی فەرمانەکانی ئەون و بەرەو ئەو جێیە دەڕۆن کە ئەو سەرکردەیە ئاماژەیان بۆ دەکات.. لە هەر شوێنێك بیەوێت ئاو هەڵدەقوڵێنێت، تەنانەت لە نێوان پەنجەکانی خۆیشیەوە. خەڵکییش لەو ئاوە زوڵاڵە تێراو دەبن.. سەیری ئەو چرایە بکە کە بە بنمیچی ئەم وڵاتەدا هەڵواسراوە[2] تەنها بە

---

(١) ئاماژەیە بۆ ئەو موعجیزاتانەی کە لەسەر دەستی پێغەمبەردا ﷺ ئاشکرا بوون و، لای زانایانی لێکۆڵەر جەسپاون. (دانەر)

(٢) ئاماژەیە بۆ "مانگ" و "موعجیزەی لەتبوونی". مەولانای جامی وتوویەتی: "ئەو مرۆڤە نەخوێندەوارە لە سەر تەمەری ژیانیدا هیچی نەنووسیوە، جگە لەوەی کە تەنها یەك جار پیتی (ئەلف)ی لەسەر ڕوخساری ئاسماندا نووسی و، مانگی پێ کرد بە دوو کەرتەوە!". (دانەر)

ئاماژه‌بۆكردنێكی ئه‌و ده‌بێت به‌ دوو كه‌رته‌وه‌. وه‌ك بلێـی سه‌رانسـه‌ری ولات و هـه‌ر شتێكی تێدایه‌ بیناسن و به‌ دلنیایی بزانن كـه‌ ئـه‌م مرۆڤـه‌ سـه‌ر كرده‌یه‌: كارمه‌ندێكـه‌ لـه‌ لایـه‌ن پادشـاوه‌ ڕه‌وانـه‌كراوه‌ و ڕاگه‌یه‌نـه‌رێكی ده‌ستپاك و بێ وه‌یی فه‌رمانـه‌كانی ئـه‌وه‌، ئـه‌وه‌تا هـه‌موویان چه‌شنی سـه‌ربازی گوێڕایـه‌ڵ ملكـه‌چی فه‌رمانـه‌كانی ئـه‌ون و، گشـت مرۆڤـه‌ ژیره‌كـانی ده‌وروبه‌ریشی بـه‌ یه‌كده‌نگی ده‌ڵێـن: "ئـه‌م كه‌سه‌ نێرراوێكی به‌ڕێزی پادشـایه‌" و هـه‌موویان باوه‌ڕی پێ‌ده‌كه‌ن و ملكه‌چی گوفتار و فه‌رمانه‌كانی ئه‌ون. ئنجا نه‌ك هه‌ر ته‌نها ئه‌وان، بـه‌ڵكو هه‌موو چیا و هه‌رده‌كانی ولات و ته‌نانه‌ت چرا مه‌زنه‌كه‌یش[1] تێكڕا ته‌سـدیقی ئـه‌و ده‌كـه‌ن و به‌ ملكه‌چی و زمانی حاڵ ده‌ڵێن: به‌ڵێ، هه‌رچی ئه‌و ده‌یلێت، ڕاست و ڕه‌وا و حه‌قیقه‌ته‌.

ده‌سا ئه‌ی هاوڕێی بێ‌ئاگام! ئایا ده‌گونجێ لـه‌ گوفتـاری ئـه‌م مرۆڤـه‌ بـه‌ڕێزه‌دا بچووكـترین گریمانی فێڵ و درۆ خۆی حه‌شار دابێت؟.. حاشا.. هـه‌رگیز گریمـانی وا لـه‌ قسـه‌ و گوفتـاری ئـه‌و كه‌سـه‌دا نی‌یـه‌ كه‌ پادشـای مـه‌زن هـه‌زار مـه‌دالیا و نیشـانه‌ی بـه‌ بـه‌رۆكدا كـردووه‌ و هه‌مووشیان به‌ڵگه‌ی ڕاستی و ته‌سدیق‌كردنی ئه‌ون. ئنجا وێـڕای ئه‌مـه‌، سـه‌رجه‌می بـه‌ڕێزان و پیاوماقوولانی ولاتیـش ته‌سـدیقی‌ده‌كه‌ن و، سـه‌رتاپای گوفتاره‌كانیشـی دڵنیـایی و باوه‌ڕبه‌خۆبوونیان پێوه‌ دیاره‌. ئه‌وه‌تا له‌باره‌ی وه‌سفه‌كانی پادشـای خـاوه‌ن ئیعجـاز و فه‌رمانـه‌ ڕه‌وانه‌كانیه‌وه‌ ئه‌دوێت. جـا ئه‌گـه‌ر لـه‌ ده‌روونتـدا گریمـانێك هـه‌بێت سـه‌باره‌ت بـه‌وه‌ی كـه‌ - خوانه‌خواسته‌ - ئـه‌م نێرراوه‌ بـه‌ڕێزه‌ "درۆ" لـه‌ گوفتاره‌كـانی‌دا ببێـت، ئـه‌وا ده‌بێ ئـه‌م هـه‌موو كۆمه‌ڵانـه‌ بـه‌ درۆ بخه‌یتـه‌وه‌ كـه‌ ته‌سـدیقی ئـه‌ویان كـرد، بگـره‌ ده‌بـێ ئینكـاریی كۆشـك و چراكانی و ته‌نانه‌ت ئینكاریی "بوون"ی هه‌موو شتێك بكـه‌یت و حه‌قیقـه‌تی هـه‌موویان بـه‌درۆ بخه‌یتـه‌وه‌، ده‌نـا چ قسـه‌یه‌كت پێ‌یـه‌ بیڵـێ و هـه‌ر شتێكیشـت لـه‌ لایـه‌ هـه‌ر ئێسـتا ده‌ریانبخـه‌ و ئاشكرایان بكه‌، وا "به‌ڵگه‌كان" سنگیـان لـێ ده‌رپه‌ڕاندوویت و به‌رهه‌ڵستیت ده‌كه‌ن!

---

(١) ئاماژه‌یه‌ بۆ "خۆر" كه‌ به‌ گه‌ڕانه‌وه‌ی زه‌وی به‌ره‌و خۆرهه‌ڵات، له‌ ئاوابوون دواكه‌وت، به‌ ڕاده‌یه‌ك كه‌ لـه‌ لایـه‌ن خه‌ڵكی‌یه‌وه‌ سـه‌رله‌نوێ بینرایه‌وه‌. جـا لـه‌سـه‌ر بناغه‌ی ئه‌م موعجیزه‌یه‌، ئیمـامی عـه‌لی - خـوای لـێ ڕازی بێـت - نوێژه‌كه‌ی عه‌سری بـه‌جێ‌هێنا كه‌ بـه‌هۆی خه‌ولێكـه‌وتنی پێغه‌مبـه‌ره‌وه‌ ﷺ له‌سـه‌ر ڕانی خـه‌ریك بـوو كـاتی به‌سـه‌ر بچێت (*) (دانه‌ر)

(*) "بێخود"ی شاعیریش ئاماژه‌ی بۆ ئه‌م دوو موعجیزه‌یه‌ كردووه‌ كاتێ كه‌ وتوویه‌تی:

صه‌لاتی حه‌ق له‌سه‌ر شه‌هێ كه‌ شه‌ق ئه‌كا قه‌مه‌ر له‌ دوور

سه‌لامی حه‌ق له‌سه‌ر مه‌هێ كه‌ ئه‌سپی "خۆر" له‌ غار ئه‌كا

(وه‌رگێڕ)

**□ بەڵگەی دوازدەهەم:**

کاکی هاوڕێم! لەوانەیە بەو قسانەی بۆمان کردیت وردە وردە چاوت کرابێتەوە و ژیریت هاتبێتەوەبەر! وا ئێستاش بەڵگەیەکت بۆ ڕوون دەکەمەوە کە لە هەموو بەڵگەکانی پێشوو مەزنتر بێت:

سەیری ئەو فەرمانە پادشاییانە بکە کە لە ئاسۆ بەرزەکانەوە دابەزیون و، هەموو ئەو حەشاماتە ڕێز لە ڕوویاندا دەنوێنن و، بە چاوی شکۆداری و سەرسووڕمانەوە بۆیان دەڕوانن و، ئەو مرۆڤە بەڕێزەش کە مەدالیاکانی بە بەرۆکدا ریزکراوە لە تەنیشتی فەرمانە نوورانییەکانەوە[1] ڕاوەستاوە و واتاکانیان بۆ ئەو جەماوەرە جەمبووە ڕوون دەکاتەوە.. تەماشای شێوازی فەرمانەکان بکە، ئەوەندە درەخشان و پرشنگدارن کە هەموانیان خستووەتە ڕێزلێنان و سەرسووڕمانەوە، چونکە لە چەند مەسەلە و کێشەیەکی هێندە جیددییەوە دەدوێن کە مایەی بایەخ پێدانی گشت لایەکە و، کەسێك نەماوە گوێی لێ ڕانەگرێت. شێوازی ئەو فەرمانانەش بە جۆرێکی وایە کە بە تەواوەتی کاروبار و وەسفەکانی پادشا ڕوون دەکەنەوە.. جا هەروەك مۆری تایبەتیی پادشا بەسەر ئەو فەرمانانەوە نەخشاوە، بە هەمان جۆر لەسەر یەكبەیەکی دێڕەکانیشی نیشانەی پادشا دیارە، تەنانەت گەر بە وردی سەرنج بدەیت، ئەوا لە هەموو ڕستەیەکدا بەڵکو لە هەموو پیتێکیدا، وێڕای واتا و ئامانج و "ئەمر" و "نەهی"یەکانی، تەمغەی تایبەتیی پادشایش دەبینیت کە لە هەموو یەکێکیان دراوە و لەسەر گشتیان نەخشێنراوە.

بە پوختی: هەروەك "ڕووناکی" دەبێت بە بەڵگە لەسەر "بوونی ڕۆژی درەخشان"، بە هەمان جۆر ئەو "فەرمانانە"ش بەڵگەن لەسەر "بوونی پادشای مەزن"!

* * *

دەسا ئەی کاکی هاوڕێم! پێم وایە هاتبیتەوە سەر هۆشی خۆت و لە خەوی بێئاگایی بێدار بوو بیتەوە! چونکە ئەو بەڵگانەی ڕوونمان کردنەوە بۆت، سەروزیادی بێداربوونەوەی تۆن. ئێستاش گەر شتێك بە پێویست دەزانیت باسی بکەیت فەرموو بیخەرەڕوو و پێی بدوێ..

---

(١) ئاماژەیە بۆ قورئانی پیرۆز، نیشانە لەسەر نەخشاوەکەشی ئیعجازەکەیەتی. (دانەر)

ئەو مرۆڤەی کە پێشتر سەرسەختیی دەنواند، ئێستا لە وەڵامدا وتی:

- تەنها ئەوەندە دەڵێم کە: سوپاس بۆ خوای گەورە. وا پڕ بـە دڵ بـاوەڕم کـرد، بەڵکو بە چەشنێکی ڕوونی وەك خۆر و ڕۆژی ڕووناك باوەڕم هێنـا و دڵنیـا و قـایل بـووم کـە ئەم وڵاتە خاوەنێکی "کامڵ" و، ئەم جیهانەش موڵکدارێکی "شکۆمەند" و، ئەم کۆشکەش بنیاتنەرێکی خاوەن "جوانی"ی هەیە. خوای گەورە لێت ڕازی بێت ئەی دۆستی دڵسـۆزم! بە ڕاستی لـە کۆت و زنجیری: ئینکـاری و سەرسـەختی و دەمارگـیریی بێزلێکراو ڕزگـارت کـردم، کـە گەیاندبوومیانە ڕادەی شێتی و گەلحۆیی..

برام! چی لە تۆ بشارمەوە؟ گەر ڕاستت دەوێت هـەموو یـەکێك لـەو بەڵگانـەی هێناتنەوە سەروزیادی ئەوەن بەم ئەنجامەم بگەیەنن، بەڵام لە ناخەوە ئارەزوومەندی بیستن بـووم و حـەزم دەکرد گوێ لە بەڵگـە یـەك لـە دوای یەکەکان ڕابگرم، چونکـە هـەر بەڵگەیـەکی نـوێ لـەو بەڵگانە چەندین ئاسۆی فراوانتریان بەرەو "ناسین" و، چەندەها پەنجەرەی ڕووناکتریان ڕووەو "خۆش ویستن"ی بێ گەردی پادشا لـێ کردمەوە.

* * *

بـەم جـۆرە، ئـەم چیرۆکـە لـێرەدا کـۆتایی پێ‌هـات، کـە ئاماژەی بـۆ ڕاسـتیی مـەزنی: "تەوحید" و "ئیمان بە خوا" دەکرد.

ئنجا پشت بە فەزڵی خوای گەورە و ڕێژنەی قورئانی پیرۆز و نـووری ئیمـان دەبەستین و، لـە مـەقامی دووهەمیشـدا، بەرامبـەر بـەو دوازدە بەڵگانـەی پێشـوو، دوازدە "بریسـکانەوە"ی خۆری "تەوحیدی ڕاسـتەقینە" بـاس دەکـەین، دوای ئـەوەی کـە بـە نووسـینی "پێشـەکی"یـەك ڕێیان بۆ خۆش دەکەین.

ومن الله التوفيق والهداية.

# مەقامی دووهەمی

## وتەی بیست و دووهەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿اللهُ خـــالِقُ كُلِّ شـــيءٍ وهو على كُلِّ شيءٍ وكيلٌ ۞ له مقاليدُ السّـــــموات والأرض﴾(الزمر:٦٢-٦٣)

﴿فَسُبحانَ الّذي بيده مَلَكوتُ كُلِّ شيءٍ وإليهِ تُرْجَعون﴾ (يس:٨٣)

﴿وَإنْ مِنْ شيءٍ إلاّ عِندنا خَزائِنُهُ وما نُنَزِّلُهُ إلاّ بِقَدَرٍ مَعْلوم﴾ (الحجر:٢١)

﴿ما مِنْ دابّةٍ إلاّ هو آخِذٌ بناصِيَتِها إنَّ ربّي على صِراطٍ مُستقيم﴾ (هود:٥٦)

## پێشەکی

بە کورتی لە پەیامی: "دڵۆپێك لە دەریای تەوحید"دا جەمسەری پایەکانی ئیمانمان ڕوون کردەوە (کە باوەڕبوونە بە خوای گەورە) هەر لەو پەیامەدا چەسپاندمان کە هەموو یەکێك لە بوونەوەران بە پەنجا و پێنج زمان دەبن بە بەڵگە لەسەر "بوون"ی خوای گەورە و، شایەتی لەسەر "یەکتایی" ئەو دەدەن.. هەروەها لە پەیامی: "خاڵێك لە نووری ناسینی خوای گەورە"شدا چوار بەڵگەی هەمەکیی ئەوتۆمان لەسەر: "پێویستیی بوون" و "یەکتایی"ی خوای گەورە هێنایەوە کە هەریەکەیان ئەوەندەی هەزار بەڵگە بەهێزن.. هەروەك لە نزیکەی دوازدە پەیامی عەرەبیشدا سەدان بەڵگەی بەهێز و گومانبڕمان باس کردووە، کە هەرهەموویان: "پێویستیی بوون" و "یەکتایی" خوای گەورە ڕوون دەکەنەوە.

لەبەر ئەوە، بەو بەڵگانەی لەو پەیامە ناوبراوانەدا هێنراون، واز دەهێنین و ناڕۆینە ناو درێژەپێدان و وردەکاریی تازەوە، بەڵام لەم "وتەی بیست و دووهەم"ەدا تێدەکۆشین "دوازدە بریسکانەوە"ی خۆری: "باوەڕ بە خوا" دەربخەین کە لە پەیامەکانی تردا بە کورتی باس کراون.

◆ **بریسكانه‌وه‌ی یه‌كه‌م:**

"ته‌وحید" دوو ته‌وحیده‌. با به‌ نموونه‌یه‌ك ڕوونیان بكه‌ینه‌وه‌:

ئه‌گه‌ر چه‌ندین كه‌ره‌سه‌ و شمه‌ك و بابه‌تی بازرگانیی جۆراوجۆری كه‌سێكی گه‌وره‌ی به‌ده‌سته‌ڵات هاته‌ ناو بازاڕێك یان شارێكه‌وه‌، ئه‌وا به‌ دوو شێوه‌ ده‌زانرێت كه‌ ئه‌و كه‌ره‌سانه‌ موڵكی ئه‌و كه‌سه‌ن:

**یه‌كه‌م:** به‌ شێوه‌یه‌كی پوخت و گشتی (واته‌ لای زۆرینه‌ و عه‌وامی خه‌ڵكی). ئه‌ویش به‌م جۆره‌یه‌ كه‌: "ده‌زانێت جگه‌ له‌و كه‌سه‌ ده‌سته‌ڵاتداره‌، له‌ توانای كه‌سانی تردا نی‌یه‌ كه‌ خاوه‌نی ئه‌م چه‌شنه‌ كاڵا و سامانه‌ زۆر و زه‌به‌نده‌یه‌ بن". به‌ڵام له‌ گۆشه‌نیگای ڕوانینی ئه‌و مرۆڤه‌ عه‌وامه‌وه‌: ده‌گونجێ ئه‌و سامانه‌ زه‌وت بكرێت و كه‌سانێكی زۆر لافی خاوه‌نێتیی ئه‌و كه‌ره‌سانه‌ لێ بده‌ن..

**دووهه‌م:** به‌ خوێندنه‌وه‌ی نووسراوی سه‌ر یه‌ك به‌ یه‌كی ده‌سته‌ و به‌سته‌كه‌كانی ئه‌و كه‌ره‌سانه‌ و ناسینی ئه‌و "مۆر" و "ته‌مغانه‌ی" كه‌ له‌ هه‌موو یه‌كێكی كاڵا و كه‌ره‌سه‌كان دراون. واته‌ له‌م حاڵه‌ته‌دا هه‌موو شتێكی ئه‌و كه‌ره‌سانه‌ - له‌ ناوه‌رۆكدا - خاوه‌نه‌كه‌یان ده‌ناسێنن.

جا هه‌روه‌ك كه‌ره‌سه‌ و بابه‌ته‌ بازرگانی‌یه‌كان به‌ دوو شێوه‌ خاوه‌نه‌كه‌ی خۆیان ده‌ناسێنن، "ته‌وحید"یش وایه‌، دوو جۆره‌:

**یه‌كه‌میان:** ته‌وحیدی ڕواڵه‌تیی عه‌وامه‌كانه‌ كه‌ بریتی‌یه‌ له‌وه‌ی: "خوای گه‌وره‌ یه‌كێكه‌ و، هاوبه‌ش و هاوو‌ێنه‌ی نی‌یه‌، ئه‌م بوونه‌وه‌رانه‌ش موڵكی ئه‌ون".

**دووهه‌میان:** ته‌وحیدی ڕاسته‌قینه‌یه‌، كه‌ بریتی‌یه‌ له‌: ئیمانێكی دامه‌زراوی پڕ له‌ دڵنیایی و ته‌واو نزیك له‌ "شهوود"ه‌وه‌ به‌ "یه‌كتایی" خوای گه‌وره‌ و ده‌رچوونی هه‌موو شتێك له‌ ده‌ستی توانستی ئه‌و خوایه‌ و، به‌وه‌ی كه‌ له‌ خوایه‌تی‌دا هاوبه‌شی نی‌یه‌ و، له‌ په‌روه‌ردگارێتی‌دا بێ یاریده‌ده‌ره‌ و، له‌ موڵك و ده‌سته‌ڵاتیشی‌دا هیچ دژ و نه‌یارێكی نی‌یه‌.. ئیمانێكی ئه‌وتۆ كه‌ دڵنیایی و سره‌وت و حه‌وانه‌وه‌ی هه‌میشه‌یی به‌ دڵی خاوه‌نه‌كه‌ی ببه‌خشێت. چونكه‌ به‌ چاوی خۆی نیشانه‌ی توانست و مۆری په‌روه‌ردگاری و نه‌خش و نیگاری قه‌ڵه‌مه‌كه‌ی به‌سه‌ر هه‌موو شتێكه‌وه‌ ده‌بینێت. به‌م جۆره‌، له‌ هه‌موو شتێكه‌وه‌ په‌نجه‌ره‌یه‌كی ڕوونی به‌سه‌ر نووری ناسینی خوای گه‌وره‌دا، لێ ده‌كرێته‌وه‌.

وا له‌م "وته‌"یه‌دا چه‌ند تیشكێك ده‌خه‌ینه‌ ڕوو كه‌ ئه‌و ته‌وحیده‌ خاوێن و به‌رزه‌مان بۆ ڕوون ده‌كه‌نه‌وه‌.

**بێدارکردنەوەیەك لە نێوان ئەم بریسکانەوەی یەکەمەدا:**

ئەی مرۆڤی بێئاگای نوقمی هۆپەرستی!

باش ئاگاداربە و بزانە کە: "هۆکارەکان" لە ڕاستی‌دا تەنها چەند پەردەیەکن لە بەردەم کردارەکانی توانستی خوای گەورەدا دادراونەتەوە. چونکە "عیززەت" و "مەزنایەتی" - کە دوو سیفەتی خوای گەورەن - داخوازی دانانی ئەو پەردانەن.. بەڵام بکەری ڕاستەقینە هەر تەنها توانستی صەمەدانییەتی خوای گەورە خۆیەتی، چونکە "تەوحید" و "شکۆمەندی" داخوازی سەربەخۆیین و داواکاری ئەوەن کە بکەری ڕاستەقینە هەر تەنها ئەو توانستەی خواوەند بێت!

ئەوەش بزانە کە کارمەندەکانی پادشای ئەزەل، هەرگیز جێبەجێکەری ڕاستەقینەی کاروبارەکانی دەستەڵاتداری و پەروەردگارێتیی ئەو نین، بەڵکو لە ڕاستی‌دا ئەوان چەند پێناسەر و، دەلاڵ و، بانگەوازکار و، بینەرێکی سەرسووڕماوی ئەو دەستەڵاتدارێتی‌یەی "پادشای ئەزەل"ن و، تەنها بۆ مەبەستی دەرخستنی: عیززەتی توانستی پەروەردگار و، سام و شکۆ و، مەزنایەتی‌یەکەی بەدی هێنراون و، بۆ ئەوەن کە: مامەڵەی ڕاستەوخۆی "دەستی توانست" لەو شتانەدا دەرنەکەوێت کە لە بەرچاودا بە هەندەکی و نزم دەردەکەون و زۆربەی بێئاگایان لایەنی جوانی‌یان نابینن و حیکمەتی بەدیهاتنیشیان نازانن و، بە ناڕەوا و نەزانی سکاڵا و بەهانەیان لە ڕوودا دەنوێنن.. ئەو هۆکارە کارمەندانەی پادشای ئەزەل وەکو کارمەندەکانی پادشایانی مرۆڤ نین کە لە ئەنجامی پێویستی و دەستەوسانی و کۆڵەواری‌یەوە، لەسەر کار دایانمەزراندوون و لە دەستەڵاتی خۆیاندا بەشداریان کردوون!

کەواتە "هۆکارەکان" بۆ ئەوە لە بەرچاودا دانراون تاکو لە ڕووی تەماشاکردنی ڕواڵەتیی عەقڵەوە "عیززەتی توانست"ی خوای گەورە بە پارێزراوی بمێنێتەوە، چونکە هەموو شتێك - وەك ئاوێنە - دوو ڕووی هەیە، ڕووی: "مولك" کە وەکو دیوی بۆیەکراوی ڕەنگاوڕەنگی ئاوێنەیە و، جێی ڕەنگ و حاڵەتە جۆراوجۆرەکانە.. ڕووی دووهەمیش: ڕووی "مەلەکووت"ە، کە وەك دیوی ساف و بێگەردی ئاوێنە وایە. جا لە دیوی دەرەوەدا - کە دیوی مولکە - چەندین حاڵەت هەن کە بە ڕواڵەت پێچەوانەی عیززەت و کەماڵی توانستی صەمەدانیی خواوەندن. لەبەر ئەوە، لەم ڕووەدا هۆکارەکان دانراون و کراون بە پەردە تاکو ئەو حاڵەتانەیان بدرێنە پاڵ و ببن بە هۆکاریان.. بەڵام هەموو شتێکی دیوی: مەلەکووت و ڕاستەقینەی شتان، ڕوون و جوان وقەشەنگن و شیاوی ئەوەن کە خودی

دەستی توانست مامەڵەی ڕاستەوخۆیان لەگەڵدا بكات و پێچەوانـە و دژی داخوازیيـەكانی ئەو عیززەت و توانستە نین.

كەواتـە هۆكارەكـان تەنـها ڕواڵـەتین و كاریگـەریی ڕاسـتەقینەیان لـە ڕووی مەلەكووتییەت و ڕاستیی هیچ شتێكدا نیيە.

جگە لەمە، داناییيەكی تریش لە دانانی هۆكـارە ڕواڵەتیيـەكاندا دەبینـرێت، كە بریتیيـە لەوەی: سكاڵای نابەجێ و بەهانەی ناڕەوا ئاراستەی خـوای گـەورەی خـاوەنی "دادگـەریی ڕەها" نەكرێن. واتە هۆكارەكان بـۆ ئـەوە دانـراون تـاكو ببن بـە نیشـانەی تـیری ئـەو بەهانـە و سكاڵایانە، چونكە ئەو ناڕەواییيانەی كە سكاڵایان لە دەست دەكرێت، لە بێتوانایی و كـەم لێهاتوویی هۆكارەكانەوە پەیدا بوون.

بۆ ڕوونكردنەوەی ئەم نهێنیيە، نموونەیەكی ناسك و گفتوگۆیەكی مەعنەوی باس كراوە، كە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - عەرزی پەروەردگاری كرد:

- (كاتێ من فەرمانی گیانكێشان ئەنجام دەدەم، بەندەكانت لێم وەڕس دەبن و سكاڵام لە دەست دەكەن)!

خوای گەورەش - بە زمانی حیكمەت - وەڵامی دایەوە:

- (لـە نێـوان تـۆ و بـەندەكانمدا پـەردەی موسـیبەت و نەخۆشـیيەكان دادەنێـم، تـاكو سكاڵاكانیان ئاراستەی ئەو پەردانە بكەن).

بە هەمان جۆریش سەرنج بدە و بزانە كە:

هـەروەك نەخۆشـیيەكان پـەردەن و ئـەو شـتانەیان ئاراسـتە دەكرێـت كـە سـەبارەت بـە ئەجەلەوە وا گومان دەبرێ خراپە و نەشیاو بن..

هـەروەك ئـەو جوانیيـەی كـە لـە گیانكێشـاندا هەیـە و ڕاسـتیی گیانكێشـانە، هـی كارمەندییەكەی حەزرەتی عیزرائیلە، دروودی لەسەر بێت..

بە هەمان جۆر، حەزرەتی عیزرائیل خۆیشی پەردەیەكە بۆ ئەنجامدانی ئەو كارمەندییـە و لـە بـەردەم توانستی خـوای گـەورەدا دادراوەتـەوە! ئـەوەتا ئـەو حاڵەتانـەی كـە بـە ڕواڵـەت میهرەبانیيان پێـوە دیـار نیيـە و شـایانی كـەماڵی توانسـتی پەروەردگـار نـین، ئاراسـتەی ئـەو دەكرێن!

بەڵێ، "عـیززەت" و "مەزنايـەتی" داخـوازی دانـانی هۆكـارە ڕواڵەتیيـەكانن لـە بـەردەم ڕوانینی "ژیری"دا.. "تـەوحید" و "شـكۆمەندی"ش دەسـتی هۆكارەكـان لـە كاریگـەریی ڕاستەقینە دەگێڕنە دواوە!

◆ **بریسکانەوەی دووهەم:**

سەرنج لە پێستانی ئەم بوونەوەرانە بدە و.. بۆ باخ و گوڵزاری ئەم سەر زەوی‌یە بڕوانە و.. بە وردی سەیری ڕووی جوانی ئەم ئاسمانە بە ئەستێرە گەشاوەیە بکە..

دەبینیت:

بەدیهێنەری مەزن، مۆرێکی لەسەر گشت دروستکراوەکانی خۆی نەخشاندووە کە تایبەتە بە دروستکەری هەموو شتێکەوە و..

نیشانەیەکی لەسەر هەموو بەدیهێنراوێك داناوە کە تەنها هی بەدیهێنەری هەموو شتێکە و..

لەسەر گشت پەخش و بڵاوکراوە و نووسراوێکی قەڵەمی توانستی خۆیشی - کە بەسەر لاپەڕەکانی: شەو و ڕۆژ و زستان و هاوینەوە نووسیونی - دروشمێکی وای داناوە کە تایبەتە بە پادشای ئەزەل و ئەبەدەوە و بە هیچ کەسێك لاسایی ناکرێتەوە.

وا بۆ نموونە، هەندێ لەو مۆر و نیشانانە باس دەکەین. فەرموو لە نێوان نیشانە لەژمارەبەدەرەکانی‌دا تەنها سەیری ئەم نیشانەیە بکە کە بەسەر "ژیان"ەوە نەخشاندوویەتی:

(دەبینیت خوای گەورە، لەتەنها یەك شت هەموو شتێك و.. لە هەموو شتێکیش تەنها یەك شت، بەدی دەهێنێت)!

ئەوەتا لە "ئاوی مەنی" یان "ئاوی خواردنەوە" چەندین ئەندام و کۆئەندامی لەژمارەبەدەر بۆ "زیندەوەر" بەدی دەهێنێت.. بێ گومان ئەم کارە تایبەتە بە تەنها کەسێکەوە کە خاوەنی توانستی ڕەهایە..

پاشان گۆڕینی ئەو خواردەمەنی‌یانەش کە لە زیندەوەر یان لە ڕووەك پێکهاتوون، بە ڕێسایەکی ورد و تەواوی، بۆ لەشێکی تایبەتی یان پێستێکی تایبەتی و کۆئەندامێکی دیاری کراوی زیندەوەر و، پێکهێنان و دروستکردنی ئەو لەش و پێست و کۆئەندامە لەو ماددە جۆراوجۆرانە، بێ هیچ گومانێك، کارێکی تایبەتە بە کەسێکەوە کە بەسەر هەموو شتێکدا بەدەستەڵاتە و خاوەنی زانیاریی ڕەهایە.

بەڵێ، بەدیهێنەری "ژیان" و "مردن" هەموو شتێکی ئەم دنیایە بە دانایی و بە یاسایەکی "ئەمری"ی پڕ لە ئیعجاز بەڕێوە دەبات، بە ڕادەیەك کە هەرگیز ناگونجێ هیچ کەسێك ئەو یاسایە جێ‌بەجێ بکات جگە لەو خاوەن توانستەی کە جڵەوی سەرجەمی گەردوونی بە دەستە.

جا ئەگەر پشکۆی "ژیری"ت نەکوژابێتەوە و بینایی "دڵ"یشت لەدەست نەدابێت، ئەوا تێ دەگەیت کە دروستکردنی یەك شت لە هەموو شتێك (بە ئاسانی‌یەکی ڕەها و

ڕێكوپێكی‌یه‌كی ته‌واو).. هەروەها دروستكردنی هەموو شتێك لە یەك شت (بە تەرازوویەكی ورد و ڕێكوپێكی‌یەكی جوان و ڕەنگین و كارامەیی و داهێنانكاری) لە ڕاستی‌دا نیشانەیەكی ڕوون و ئاشكرایە لەسەر دروستكەر و بەدیهێنەری هەموو شتێك..

خۆ ئەگەر كەسێكت دی چەندین كرداری نائاسایی ئەنجام دەدا، بۆ نموونە وەك ئەوەی كە: لە كێشانەی یەك درەم لۆكە سەد تۆپە كووتاڵی خوریی سادە و چەندین تۆپ ئاوریشم و چەندەها جۆری پارچەی تری دەچنی و.. جگە لەمانەش، هەر لەو ئەندازە لۆكەیە چەندەها شیرینیی بەتام و لەزەتی جۆراوجۆری دەردەهێنا و.. ئنجا دەتبینی كە: ئاسن و، بەرد و، هەنگوین و، ڕۆن و، گڵ و، ئاوی دەگرت بە دەستەوە و "زێڕ"ێكی پوخت وخاوێنی لێ دروست دەكردن..

گەر بە چاوی خۆت ئەمانە ببینیت، ئەوا بێ هیچ گومانێك، بڕیار دەدەیت كە ئەو كەسەی ئەم كارانە ئەنجام دەدات خاوەنی كارامەیی‌یەكی دەراسا(معجز)ی ئەوتۆیە كە هەر تایبەتە بە خۆیەوە و، دارای توانستێكی زاڵی ئەوتۆیشە كە دەستەڵاتی هەڵسوكەوت و ڕەفتار كردنی لەناو هەموو بوونەوەرانی گەردووندا هەیە، بە ڕادەیەك كە سەرجەمی توخمەكانی زەوی لە ژێر فەرمانی ئەودان و، هەر شتێكیش لەم خاك و گڵە دەردەچن فەرمانی ئەو جێبەجێ دەكەن.

جا ئەگەر سەرت لەمە سووڕدەمێنێت، ئەوا بزانە كە: دەرەوشانەوەی توانست و دانستی خوای گەورە لە "ژیان"دا، هەزار جار لەم نموونەیە سەرسووڕهێنەرترە!

ئەمەی كە ڕابورد، یەكێك بوو لەو نیشانە زۆر و زەبەندانەی كە لەسەر "ژیان" نەخشێنراون.

◆ **بریسكانەوەی سێ‌هەم:**

سەیری "زیندەوەران" بكە، كە لە ناوەندی ئەم بوونەوەرە بەخوڕەمە لافاو ئاسا و بزۆكانەدا دێن و دەڕۆن..

دەبینیت:

هەموو یەكێك لەو زیندەوەرانە چەندەها مۆری زۆریان لەسەر دراوە، كە خوای گەورەی "زیندووی ڕاگیركەری گەردوون" لە ڕوویاندا نەخشاندوونی.. فەرموو سەیری یەكێك لەو مۆرانە بكە:

دەبینیت ئەو زیندەوەرە - با بڵێین ئەم مرۆڤە بێت - وەك نموونەیەكی بچووككراوە و پوختی ئەم گەردوونە و، بەری درەختی بەدیهاتووان و، "ناوك"ی ئەم جیهانە وایە. چونكە زۆربەی نموونەكانی گشت جۆرەكانی ئەم جیهانەی تێدا كۆبوونەتەوە و، دەڵێی - ئەو

زیندەوەرە - "دڵۆپ"ێکە لە سەرجەمی گەردوون دۆشراوە و داچۆڕراوە و بە چەندین تەرازووی سەرنەکەری زانستی‌یانەی ورد لێی هەڵێنجراوە..

لەبەر ئەمە، بۆ بەدیهێنان و پێگەیاندن و چاودێری کردنی ئەم تەنها زیندەوەرە، دەبێ سەرجەمی گەردوون لەناو دەست و ژێر فەرمانی بەدیهێنەری‌دا بێت.

جا ئەگەر ژیریت نوقمی وەهم و گومان نەبووبێت، ئەوا تێدەگەیت لەوەی "هەنگ" - کە نموونەیەکی توانستی پەروەردگارە - لە شێوەی پێرستێکی بچووک کراوەی زۆر شتاندا دروست کراوە..

زۆربەی مەسەلەکانی ناو پەڕاوی گەردوون، لە قەوارەی ئەم مرۆڤەدا نووسراوە، کە نموونەی تەنها یەك "لاپەڕە"ی توانستی بەدیهێنەرە..

پرۆگرامی درەختی زەبەلاحی هەنجیر، لەناو تۆوە یەکجار بچووکەکەی‌دا دانراوە، کە هەریەکەیان نموونەی یەك "نوختە"ن لە پەڕاوی توانستدا.

ئاسەواری ناوە جوانە گشتگیرەکانی خوای گەورە بەسەر لاپەڕەکانی ئەم گەردوونە مەزنەوە، لە "دڵ"ی مرۆڤدا پیشان دراون، کە نموونەی یەك دانە "پیت"ی ئەو پەڕاوەیە..

بە ئەندازەی کتێبخانەیەکی مەزنیش "زانیاری" لە بارەی ژیانی مرۆڤەوە، لە "بیر"ی لەڕادەبەدەر بچووکی ئەو مرۆڤەدا ڕیز کراوە.

جا ئەگەر "ژیری"ت نوقمی وەهم و گومان نەبووبێت، بە بێ گومانی تێدەگات لەوەی کە هەموو ئەمانەی باس کران: مۆری تایبەتیی ئەو کەسەن کە "بەدیهێنەری هەموو شتێك" و "پەروەردگاری هەموو جیهانەکان"ە!

خۆ ئەگەر لە نێوان چەندین مۆری زۆر و زەبەندەی لەژمارەبەدەری پەروەردگاردا بەسەر "زیندەوەرانەوە" تەنها یەك دانە مۆر ڕووناکیی خۆی ئاوا ئاشکرا کردبێت، بە ڕادەیەك کە نیشانە و ئایەتەکانی خۆی بە ڕوونی خستبێتە بەرچاوی خوێنەرانی و ئەوانیش خوێندبێتیاننەوە.. دەبێ چی بڵێیت گەر بتوانیت سەیری سەرجەمی "زیندەوەران" بکەیت و گشت ئەو مۆرانە پێکەوە و بە یەك جار ببینیت؟! ئایا لەتاو سەرسووڕماندا ناڵێیت:

"سبحان من اختفی بشدة ظهوره"؟!

◆ **بریسکانەوەی چوارەم:**

بۆ ئەم بوونەوەرە ڕەنگاوڕەنگ و قەشەنگ و پەرش و بڵاوانەی سەر ڕووی زەوی و، ئەم بەدیهاتووە جۆراوجۆر و مەلەوانانەی ناو دەریای ئاسمان، بڕوانە و بە وردی سەرنجیان بدە:

ده‌بینیت:

هه‌موو یه‌كێك له‌و بوونه‌وه‌رانه‌، مۆرێكی خواوه‌ندی "ڕووناكی‌به‌خشی ئه‌زه‌لی"یان له‌سه‌ر نه‌خشاوه‌ كه‌ به‌ هیچ كه‌سێك لاسایی ناكرێته‌وه‌..

جا هه‌روه‌ك نیشانه‌ و دروشمه‌كانی ئه‌و خواوه‌نده‌ ئه‌زه‌لی‌یه‌ له‌سه‌ر "ژیان" و، مۆره‌كانیشی به‌سه‌ر "زینده‌وه‌ران"ه‌وه‌ ده‌بینرێن (ئه‌وه‌بوو هه‌ندێكیشمان لێ بینین).. به‌ هه‌مان جۆر چه‌نده‌ها دروشم و نیشانه‌ش به‌سه‌ر "ژیاندن" واته‌: به‌خشینی ژیانه‌وه‌، ده‌بینرێن. و به‌ نموونه‌یه‌ك سه‌یری "ڕاستی"ی ئه‌م نیشانانه‌ ده‌كه‌ین، چونكه‌ "نموونه‌ هێنانه‌وه‌" واتا قووڵته‌كان له‌ زه‌ینی مرۆڤه‌وه‌ نزیك ده‌خاته‌وه‌:

به‌سه‌ر یه‌ك به‌ یه‌كی: ئه‌ستێره‌ و.. هه‌ساره‌ گه‌ڕۆك و مه‌له‌وانه‌كانی ناو ده‌ریای ئاسمان و.. دڵۆپه‌ ئاوه‌كان و.. پارچه‌كانی شووشه‌ ورده‌ و.. كلووی بریسكاوه‌ی به‌فره‌كانه‌وه‌، مۆری ڕه‌نگدانه‌وه‌ی وێنه‌ی "خۆر" و ئاسه‌وارێكی ڕووناك و تایبه‌ت به‌و خۆره‌، ده‌بینرێت. جا ئه‌گه‌ر باوه‌ڕ به‌وه‌ نه‌كه‌یت كه‌ ئه‌و وردیله‌ خۆرانه‌ی له‌و شته‌ له‌ژماره‌به‌ده‌رانه‌وه‌ ده‌بریسكێنه‌وه‌، هی تیشكدانه‌وه‌ و ڕه‌نگدانه‌وه‌ی ڕووناكیی خۆری ئاسمانن، ئه‌وا ناچار ده‌بیت باوه‌ڕ به‌ بوونی خۆرێكی ڕاسته‌قینه‌ له‌ هه‌موو دڵۆپه‌ ئاوه‌كان و، گشت پارچه‌ شووشه‌ و، گه‌ردیله‌ به‌ره‌و خۆر ڕاگیراوه‌كان بكه‌یت! خۆ ئاشكرایه‌ گه‌ر له‌و باوه‌ڕه‌دا بیت. ئه‌وا داده‌به‌زیته‌ نزمترینی پله‌كانی نه‌فامی و شێتی‌یه‌وه‌!

هه‌ر به‌م جۆره‌ش خوای گه‌وره‌ (كه‌ نووری ئاسمانه‌كان و زه‌وی‌یه‌) له‌ ڕووی: "ژیاندن" و به‌خشینی ژیانه‌وه‌ به‌ زینده‌وه‌ران، چه‌ندین دره‌وشانه‌وه‌ی نوورانیی هه‌یه‌. چونكه‌ "ژیاندن" نیشانه‌یه‌كی ڕوون و مۆرێكی ئاشكرایه‌ كه‌ خوای گه‌وره‌ له‌سه‌ر هه‌موو زینده‌وه‌رێك دایده‌نێت، به‌ ڕاده‌یه‌ك كه‌ ئه‌گه‌ر گریمانی ئه‌وه‌ بكرێت گشت هۆكاره‌كان كۆ ببنه‌وه‌ و هه‌ر هه‌موویشیان بكه‌ر و خاوه‌ن ویست و ئیختیار بن، هێشتا هه‌ر ناتوانن "ژیان" به‌ هیچ بوونه‌وه‌رێك ببه‌خشن..

واته‌ ئه‌و هۆكارانه‌ به‌ یه‌كجاره‌كی ده‌سته‌وسان و كۆڵه‌وارن به‌رامبه‌ر به‌وه‌ی هیچ چه‌شنه‌ لاسایی‌یه‌كی "مۆر"ی په‌روه‌ردگار بكه‌نه‌وه‌ له‌ "ژیان به‌خشین"دا. چونكه‌ هه‌موو یه‌كێك له‌ زینده‌وه‌ران موعجیزه‌یه‌كی سه‌ربه‌خۆی توانستی خوای گه‌وره‌یه‌. ئه‌وه‌تا له‌ شێوه‌ی چه‌قه‌خاڵ(نقطة مركزية)ێكی چه‌شنی "تیشكۆ"دایه‌ بۆ دره‌وشانه‌وه‌ی ناوه‌ جوانه‌كانی خوای گه‌وره‌، كه‌ هه‌ر یه‌كه‌یان وه‌ك تیشكێكی نووری خواوه‌ند وان.

جا ئه‌گه‌ر ئه‌و دیاردانه‌ی به‌ زینده‌وه‌رانه‌وه‌ ده‌بینرێن، چه‌شنی: ئه‌و سنعه‌ته‌ی كه‌ خاوه‌نی شێوه‌یه‌كی ناوازه‌یه‌ و.. ئه‌و دانسته‌ی كه‌ سه‌رتاپا ڕێسایه‌ و.. ئه‌و دره‌وشانه‌وه‌ ڕوونه‌ش كه‌ هی نهێنیی "ته‌نیایی"یه‌، نه‌درێته‌ پاڵ خواوه‌ندی "ته‌نیای صه‌مه‌د" ئه‌وا ده‌بێ باوه‌ڕ به‌ بوونی:

توانستێکی خولقێنەری ڕەها و بێ کۆتایی و شارراوە و..
زانیاری‌یەکی فراوانی گشتگیر و..
ویستێکی ڕەهای بەتوانا بەسەر بەڕێوەبردنی سەرجەمی گەردووندا..
لە هەموو زیندەوەرێکدا، بکرێت!

تەنانەت ـ لە حاڵەتێکی وەهادا ـ دەبێ باوەڕ بە بوونی: گشت سیفەتە تایبەتەکانی تری بەدیهێنەر لەو تەنها زیندەوەرەدا بکرێت، با مێشێك یان گوڵێکیش بێت! واتە دەبێ هەموو سیفەتەکانی خوایەتیی خوای گەورە بە گشت گەردیلەیەکی یەك بە یەکی زیندەوەران بدرێن.. ڕوونتر بڵێین: دەبێ ئەو جۆرە گریمان و مەحاڵانە قبووڵ بکرێن کە مرۆڤ دادەبەزێننە نزمترینی پلەکانی گەوجی و گومڕایی و وڕێنەی هەڵیت و پڵیتی گەمژەیی‌یەوە!

چونکە خوای گەورە بارێکی دیاری‌کراوی بە گەردیلەکانی هەموو شتێك ـ بە تایبەت شتانی وەك "تۆو" و "ناوك" ـ بەخشیوە، وەك بڵێی ئەو گەردیلەیە ـ لەو بارەی‌دا ـ سەیری سەرجەمی زیندەوەرەکە دەکات، کە خۆیشی بەشێکە لەو، هەروەها بەپێی ڕێسای ئەو زیندەوەرە هەڵوێستێکی دیاری کراوی تێدا وەردەگرێت، بگرە شێوە و چۆنێتی‌یەکی تایبەتیی ئەوتۆ دەگرێتەخۆ کە سوود بە مانەوە و بەردەوامیی "جۆر"ی زیندەوەرەکە و، بڵاو بوونەوەی و، هەڵکردنی ئاڵاکەی لە گشت جێ‌یەکدا، بگەیەنێت. وەك‌بڵێی چاوی لە هەموو جۆرەکانی ئەو زیندەوەرە بێت لە سەرجەمی گۆی زەوی‌دا. ئەوەتا ـ بۆ نموونە ـ شتێکی چەشنی وردەباڵ بە "تۆو" دەبەخشرێت، تاکو پێی بفڕێت و بڵاو ببێتەوە..

هەروەها زیندەوەر هەڵسوکەوتێك وەردەگرێت کە پەیوەندیی بەو گشت بوونەوەرانەی ناو زەوی‌یەوە هەیە کە بۆ: درێژەدان بە ژیانی و، پەروەردەبوونی و، ڕزق و ڕۆزی و، مامەڵەی، پێویستی پێیان دەبێت..

کەواتە ئەگەر ئەو گەردیلەیە لە لایەن یەکێکەوە کە خاوەنی توانستی ڕەهایە، کارمەند نەبێت و، پەیوەندیی گەردیلەکە بەو خاوەن توانستە ڕەهایەوە بپچڕێنرێت.. ئەوا دەبێ ـ لە کاتێکی وادا ـ چاوێك کە هەموو شتێك ببینێت و، هەستێك کە هەموو شتێك بگرێتەوە، بەو گەردیلەیە ببەخشرێت!!

**پوختەی ئەم قسانە:**

هەروەك ئەگەر وێنەی وردیلە خۆرە درەوشاوەکان و ڕەنگدانەوەی ڕەنگە جۆراوجۆرەکان لە دڵۆپە ئاوەکان و پارچە شووشەکاندا نەدرێنە پاڵ ڕووناکیی خۆر، ئەوا دەبێ باوەڕ بە بوونی چەندین خۆری لەژمارەبەدەر بکرێت لە بریی یەك دانە خۆر.. دیارە ئەمەش داخوازی ملکەچ بوون دەبێت بۆ بیرێکی هەڵیت و پڵیتی مەحاڵ..

هەروەك ئەمە وایە.. بە هەمان جۆر، گەر بەدیهێنانی هەموو شتێك نەدرێتە پاڵ خوای گەورەی خاوەن توانستی ڕەها، ئەوا دەبێ لە بریی باوەڕبوون بە یەك خوای گەورەی "تاك"ی "تەنیا" بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەكانی گەردوون باوەڕ بە خوای لەژمارەبەدەر بكرێت! واتە دەبێ مەحاڵی وا قبووڵ بكرێت كە بە قەدەر سەد دانە مەحاڵ لە ژێرییەوە دوور بێت. بە واتایەكی تر: دەبێ بیری مرۆڤ دابەزێتە پلەی وڕێنەی شێتانەوە!

**لەمانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە:**

هەموو گەردیلەیەك سێ "پەنجەرە"ی تێدایە، بەسەر نووری "یەكتایی" و "پێویستیی بوون"ی خوای گەورەدا دەڕوانن:

*پەنجەرەی یەكەم:*

هەموو گەردیلەیەك وەكو سەرباز وایە، پەیوەندیی لەگەڵ گشت فەرمانگە سەربازییەكانی وەك: پەل و لق و تیپ و تابوور و لەشكر و سوپاكەیدا هەیە و، بە گوێرەی ئەو پەیوەندییەش كارمەندییەكی لەو فەرمانگەیەدا لە ئەستۆدایە و، بەپێی ئەو كارمەندییەش و لە نێوان ڕێساكەیدا، جموجوولێكی تایبەتیی پێ سپێرراوە دەبێ ئەنجامی بدات..

بۆ نموونە: ئەو گەردیلە بێ گیانە یەكجار وردەی لە بیلبیلەی چاوتدایە، كارمەندیی تایبەتی و پەیوەندیی دیاریكراوی هەیە لە یەك بە یەكی: چاو و، سەر و، لەش و، سەرجەمی هێزە بەرهەمهێنەر و ڕاكێشەر و پاڵنەر و وێنەگرەكانی جەستەتدا و، لەناو خوێنبەر و خوێنهێنەر و دەمارەكانتدا، تەنانەت پەیوەندیی لەگەڵ "جۆر" و ڕەگەزی مرۆڤیشدا هەیە!

بوونی ئەم هەموو پەیوەندی و كارمەندییانە لە گەردیلەدا، بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی لای كەسانی خاوەن بەسیرەت دەبن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە: گەردیلە - لە ڕاستیدا - تەنها ئاسەوارێكی داهێنان و سنعەتی خوای گەورەی خاوەن توانستی ڕەهایە و، كارمەندێكە بە فەرمانی خواوەند ڕەفتار دەكات.

*پەنجەرەی دووهەم:*

هەموو یەكێك لە گەردیلەكانی "هەوا"، گەر بیەوێت، دەتوانێت سەر لە هەموو گوڵ و بەرێك بدات و، بڕواتە ناویەوە و، كارەكانی لەوێدا ڕاپەڕێنێت..

جا ئەگەر ئەو گەردیلە وێڵ و سەرگەردانە، كار پێسپێرراو و گوێڕایەڵی خوای گەورەی خاوەنی توانستی ڕەها و بینەری هەموو شتێك نەبێت، دەبێ شارەزای هەموو كۆئەندامەكانی گشت بەر و گوڵێك و چۆنێتیی پێكهاتنیان بێت و، پەی بە سنعەتە ورد و لە

یەك جیاوازەكانیان بیات و، ئاگاداری چنین و بڕینی وێنە و شێوەكانیان بێت كە وەك كالاّ و كووتاڵ وایە و، بە كارامەیی‌یەكی تەواو بتوانێت ئەو بەرگانەیان بۆ بچنێت!!

بەم جۆرەی كە سەرنجمان دا، ئەم گەردیلەیە یەكێك لە تیشكە ڕووناك و خۆرئاساكانی "تەوحید" پەخش دەكات.

بۆ خۆت گەردیلەكانی "ڕووناكی" وەك گەردیلەكانی "هەوا" و.. ئنجا گەردیلەكانی "ئاو"یش بە چەشنی گەردیلەكانی "گڵ" لێك بدەرەوە و بیریان لێ بكەرەوە. چونكە شتان لەم چوار ماددانەوە پەیدا دەبن.

هەروەها قیاسی "ئۆكسجین و هایدرۆجین و ئازۆت و كاربۆن"یش - كە لە زانیاریی نوێدا هەن - بۆ سەر ئەو چوار توخمە ناوبراوانە بكە.

*پەنجەرەی سێ‌هەم:*

دەكرێت هەر بارستایی‌یەكی گڵ (خاك) كە لە چەندەها گەردیلەی ورد ورد پێكهاتووە، ببێت بە جێگا و سەرچاوەی گەشە كردنی هەر ڕووەكێكی گوڵدار یان بەرداری سەر ڕووی زەوی، گەر "تۆو"ە هەرە وردەكانیان تێدا بچێنرێن كە وەك ئاوی مەنی وان و لە كاربۆن و ئازۆت و ئۆكسجین و هایدرۆجین پێكهاتوون. ئەو تۆوانەش هەرچەندە لە ماهییەتدا لە یەك دەچن، بەڵام جۆرەكانیان لە یەكتر جیاوازە، چونكە "قەڵەمی قەدەر" پرۆگرامی بنەچەی ئەو جۆرەی -كە سەرتاپا شتێكی مەعنەوی‌یە - لە تۆوەكەیدا تۆمار كردووە..

بەڵێ، گەر ئەو تۆوانە یەك لە دوای یەك لە گوڵدانێكدا بچێنین، بێ گومان هەموویان گەشە دەكەن و، سەرجەمی كۆئەندامە دەراسا و، شێوە و پێكهاتنە تایبەتی‌یەكانیان بەرجەستە دەبن و دەكەونە پێش‌چاو.

جا ئەگەر هەموو یەكێك لە گەردیلەكانی ئەو گڵە، گوێڕایەڵ و.. كارمەند و.. ئامادەی ئیش و.. ژێرفەرمانی یەكێك نەبن كە ئاگای لە بارودۆخەكانی هەموو شتێكە و، توانای هەیە كە "بوون"ی شایستە و بەردەوام بە هەموو شتێك ببەخشێت، واتە گەر هەموو شتێك گوێڕایەڵ و ڕامكراوی توانستی ئەو نەبن، ئەوا دەبێ لەناو هەموو گەردیلەیەكی "گڵ"دا بە ئەندازەی ژمارەی ڕووەكەكان كارگە و مەكینە و چاپخانەی مەعنەوی هەبن، تاكو ببن بە جێگا و سەرچاوەی پێگەیاندنی ئەو ڕووەكانەی كە خاوەنی چەندەها كۆئەندامی جیاجیا و شێوە و ڕوخساری جۆراوجۆرن!!

یان دەبێ زانستێكی ئەوتۆ كە گشت گەردیلەكان بگرێتەوە و.. توانستێك كە بتوانێت كاری نەخشاندن و بەدیهێنانی ڕوخسار و كۆئەندامەكانی ڕووەك بگرێتە ئەستۆ، بدرێنە پاڵ

هەموو یەكێك لەو گەردیلانە، تاكو بتوانن ببن بە سەرچاوەی ئەو هەموو ڕووەكە جۆراوجۆرانە!!

واتە: گەر پەیوەندیی ئەو گەردیلانە بە خوای گەورەوە، بپچڕێت، ئەوا دەبێ بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەكانی "گڵ" خوای زۆر و زەبەندە لەو بارستاییەی گڵەدا قبوول بكرێت!! ئەمەش - وەك ئاشكرایە - خورافەتێكی هێندە پڕوپووچە كە هێندەی هەزار و یەك مەحاڵ، بەتاڵ و مەحاڵە و لە ژیریی مرۆڤەوە دوورە.

بەڵام گەر هەموو یەكێك لەو گەردیلانە كارمەندی كەسێكی زانای خاوەن توانای ڕەها بن، كارەكە بەلای ژیرییەوە ئاسان و بەجێ و ڕەوا دەبێت، چونكە هەروەك سەربازێكی ئاسایی سەر بە پادشایەكی مەزن، دەتوانێت (بە ناوی پادشاوە و بەهۆی پشتبەستن بە هێزی ئەو پادشایە) سەرانسەری شارێكی گەورە لە دانیشتووانی چۆڵ بكات.. یان نێوان دوو دەریای فراوان بە یەك بگەیەنێت.. یان سەركردەیەكی گەورە دیل بكات.. بە هەمان جۆر، مێشوولەیەكی بچووكیش دەتوانێت نەمروودێكی زەبەلاح تەختی زەوی بكات و، مێروولەیەكی ئاساییش دەتوانێت كۆشكی فیرعەونێك بڕووخێنێت و، تۆوێكی یەكجار بچووكی هەنجیریش دەتوانێت درەختی زەبەلاحی هەنجیر لەسەر پشتی خۆی هەڵبگرێت.. هەموو ئەم كارانەش بە فەرمانی پادشای ئەزەل و ئەبەد و، بە سایەی پەیوەندیی ئەوانەوەیە بە پادشاكەیانەوە.

* * *

هەروەك لە هەموو گەردیلەیەكدا ئەم سێ پەنجەرەیەمان دی كە بەسەر "نووری تەوحید"دا خرابوونە سەرپشت، بە هەمان جۆر گشت گەردیلەیەك دوو شایەتی ڕاستگۆشی تێدایە لەسەر: "بوون" و "یەكتایی" خوای گەورەی بەدیهێنەر..

یەكەمیان ئەوەیە كە: "گەردیلە" وێڕای كۆڵەواریی ڕەهای خۆی، كەچی چەندین كار و ئەركی تابلێی گەورە و جۆراوجۆر لە ئەستۆی خۆیدا هەڵدەگرێت!

دووهەمیان ئەوەیە كە: جموجووڵ و بزووتنی گەردیلەكان لەگەڵ ڕێسای گشتیدا تەبا و گونجاوە، بە ڕادەیەك كە هەرچەندەش بێ گیانە، كەچی لە پێش چاودا وا دەردەكەوێت كە خاوەنی هەست و شعوورێكی گشتی و هەمەكی بێت!

واتە هەموو گەردیلەیەك، بە زمانی كۆڵەوارییەكەی، شایەتی لەسەر "بوون"ی خاوەن توانستی ڕەها و.. بە زمانی پیشاندانی تەبایی تەواویشی لەگەڵ ڕێسای گشتیی گەردووندا، شایەتی لەسەر "یەكتایی" بەدیهێنەر دەدات.

ئنجا هەروەك یەكبەیەكی گەردیلەكان دوو شایەتیان تێدایە لەسەر ئەوەی كە خوای گەورە هەیە و یەكتایە، لە گشت زیندەوەرێكیشدا دوو نیشانە هەن دەری دەخەن كە ئەو خوایە "تەنیا" و "صەمەد"یشە..

بەڵێ، دوو نیشانە لە هەموو زیندەوەرێكدا هەن:

**یەكەم:** نیشانەی "ئەحەدییەت" واتە: تەنیایی خوای گەورە..

**دووهەم:** نیشانەی "صەمەدییەت" واتە: نیشانەی ئەوەی كە هەر تەنها خوای گەورە جێی نیاز و ئەنجامدەری پێویستییەكانە..

چونكە درەوشانەوەی ناوە جوانەكانی خوای گەورە، كە لە زۆربەی بوونەوەراندا دەبینرێن، "زیندەوەر" هەموو ئەو درەوشانەوانە بە یەك جار لە ئاوێنەی خۆیدا دەردەخات. وەكبڵێی "زیندەوەر" چەقەخاڵێكی چەشنی "تیشكۆ"یە بۆ درەوشانەوەی "ئیسمی ئەعزەم"ی خوای گەورەی زیندووی ڕاگیركەری گەردوون.

واتە: "زیندەوەر" بەوەی كە جۆرە سێبەرێكی "تەنیایی" زات لە ژێر پەردەی ناوی "المحیي"ی خوای گەورەدا دەردەخات، ئەوا نیشانەی "تەنیایی" لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە.

ئنجا لەبەر ئەوەش كە "زیندەوەر" وەك نموونە و پێڕستێكی بچووك و پوختی بوونەوەران و بەری درەختی بەدیهاتووان وایە، ئەوا ئامادە كردنی پێداویستییە زۆر و زەبەندە پەرش و بڵاوەكانی لە گشت لایەكی بوونەوەری فراوانەوە بۆ ناو بازنەی ژیانە یەكجار بچووكەكەی، بە یەك جاری و بەوپەڕی ئاسانی.. ئەم كارە، بە ئاشكرا نیشانەی "صەمەدانییەت" دەخاتە پێش چاو. واتە ئەم بارە ئاشكرای دەكات كە ئەم "زیندەوەر"ە پەروەردگارێكی تابڵێی باشی هەیە، بە ڕادەیەك كە هەر تەنها یەك ئاوڕلێدانەوەی ئەو پەروەردگارەی سەروزیادیەتی و پێویستیی بە هیچ شتێكی تر ناهێڵێت، بەڵام سەرجەمی شتانی تر ناتوانن جێی بۆڕوانینێكی ئەو پەروەردگارەی بۆ بگرنەوە.

بەڵێ:

**"یكفي لكلِّ شيءٍ شيءٌ عن كلِّ شيءٍ، ولا یكفي عنه كلُّ شيءٍ ولو لشيءٍ واحدٍ"!**

هەروەها ئەو بارە بۆمان دەردەخات كە: پەروەردگاری ئەو زیندەوەرە هەروەك پێویستی بە هیچ شتێك نییە، لە هەمان كاتدا گەنجینەكانیشی هیچیان لێ كەم نابێت و، سەبارەت بە توانستی ئەو چ شتێك بە كارێكی قورس دانانرێت. ئەمەش نیشانەیەكە سێبەری "صەمەدییەت"ی خوای گەورەمان بۆ دەردەخات.

واتە هەموو زیندەوەرێك بە زمانی "ژیان"ەكەی، ئایەتی پیرۆزی: ﴿**قل هو الله أحد ۞ الله الصمد**﴾مان بەسەردا دەخوێنێتەوە!

ئنجا جگه لەم پەنجەرانەی كه لێرەدا به كورتی باس كران و له شوێنی تردا درێژەمان پێ داون، چەندین پەنجەرەی تریش هەن كه - به هەمان جۆر - ڕووەو "بوون" و "یەكتایی" خوای گەورە كراونەتەوە.

كەواتە مادەم یەك بە یەكی گەردیلەكانی گەردوون سێ پەنجەرە و كلاورۆژنە دەكەنەوە و، خودی "ژیان"یش بە یەك جار دوو دەرگا ڕووەو "یەكتایی" خوای گەورە دەخاتە سەرپشت، ئەوا بۆ خۆت دەتوانیت مەودای ئەو نوورانەی ناسینی خوای گەورەی شكۆمەند لێك بدەیتەوە كە چینەكانی بوونەوەران - هەر لە گەردیلەكانەوە هەتا خۆرەكان - بە سەرجەمی گەردووندا، وەك تیشكی خۆر پەخشیان دەكەنەوە.

بۆ خۆت - لەم ڕێیەوە - لە: زۆری و فراوانیی پلەكانی بەرز بوونەوەی مەعنەویی ئادەمیزاد لە ناسینی خوای گەورەدا و، لە: پلە و پایەكانی دڵنیایی و ئارامی و سرەوتی دڵ تێبگە و.. ئنجا لەم ئەندازەیەشەوە كە لێی تێ گەیشتیت قیاسی ئەو پلە و پایانەش بكە كە هێشتا پەیت پێ نەبردوون!

◆ **بریسكانەوەی پێنجەم:**

ئاشكرایە كە: نووسینی كتێبێك، گەر دەستنووس بێت، تەنها یەك پێنووسی بەسە و، گەر چاپكراویش بێت بە ئەندازەی ژمارەی پیتەكانی پێویستی بە پیتی كانزایی دەبێت. خۆ ئەگەر بە نووسینێكی یەكجار ورد زۆربەی بابەتەكانی كتێبەكە لە هەندێ پیتیدا نووسرانەوە - وەك نووسینەوەی سوورەتی یاسین بە وردی و بچووكی لەناو وشەی "یس"دا - ئەوا دەبێ پیتە كانزاییەكان لەڕادەبەدەر بچووك بن تاكو ئەو پیتە گەورەیە بنووسن كە ئەو بابەتە زۆرانەی بە وردی تێدا نووسراونەتەوە!

جا هەروەك كتێبی دەستنووس یان چاپكراو بەم جۆرە ئامادە دەكرێن و دەخرێنە بەردەست.. پەڕاوی ئەم گەردوونەش بە هەمان جۆرە..

ئەوەتا گەر بڵێیت: پەڕاوی گەردوون نووسینی قەڵەمی توانستی خواوەندی حەق و، نووسراوی خوای گەورەی تاك و تەنیایە، ئەوا ڕێیەكی هێندە ئاسانت گرتووەتەبەر كە لە پلەی "وجوب"دایە و تا ڕادەی پێویست كارێكی پەسەندكراوی ژیرییە..

بەڵام گەر نووسینی پەڕاوی گەردوون بدرێتە پاڵ "سروشت" و "هۆكارەكان" ئەوا تا ڕادەی: نەگونجاوی و مەحاڵی (الإمتناع) ڕێگاكەت سەخت و هەڵەت و پڕ لە گیروگرفتی زۆر و خورافەتی ڕوون و ئاشكرا دەبێت. چونكە ئەو كاتە دەبێ "سروشت" ملیۆنەها ملیۆن

چاپخانەی کانزایی و کارگەی مەعنەویی بچووك لە هەموو مشتێك گڵ و خاك و گشت دڵۆپە ئاوێك و هەموو بارستاییەکی هەوادا دابنێت، تاکو هەموو یەکێ لەو ناوبراوانە دەربخات و گشت ڕووەکە بەردار و گوڵدارەکانیان لێ پەیدا بکات!

یان دەبێ لە ناچاریدا باوەڕ بەوە بکەیت کە هەموو شتێك خاوەنی زانستێك بێت سەرجەمی شتانی دنیای گرتبێتەوە و، دارای توانستێکیش بێت کە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ و دەستەڵاتدار بێت، تاکو - ئەو شتە - بتوانێت ببێت بە سەرچاوەی ئەم بەدیهاتووانە! چونکە هەموو بەشێکی "گڵ" و "ئاو" و "هەوا" دەگونجێ بکرێن بە سەرچاوەی پێگەیاندنی زۆربەی ڕووەکەکان. لە کاتێکدا کە پێکهاتنی هەموو یەکێك لەو ڕووەکانە هێندە ڕێك و پێك و، هاوسەنگ و، سەربەخۆ و، جیاوازە لەوانی تر، کە دەری دەخات هەموو یەکێکیان پێویستی بە کارگەیەکی مەعنەویی تایبەتی و چاپخانەیەکی سەربەخۆ بۆ خۆی هەیە. کەواتە گەر "سروشت" لەوە دەربچێت کە "یەکەی پێوانە" بێت بۆ بوونەوەران و، بە: "سەرچاوە" دابنرێت بۆیان، ئەوا دەبێ مەکینەکانی دروستکردنی هەموو شتێك لەناو هەموو شتێکدا ئامادە بکات!!

بەم جۆرە دەرکەوت کە بیری: "سروشت پەرستی" هەر لە بناغەوە، جگە لە بۆچوونێکی هەڵیتوپڵیت و گەوجایەتی، چیی تر نییە! تەنانەت ئەوانەش کە شوێنی بیر و بۆچوونە خورافییەکان دەکەون، شەرم لە بیر و بۆچوونی وا دەکەن!

کەواتە سەرنج لە گومڕایان بدە کە خۆیان بە "ژیر" لە قەڵەم دەدەن، بزانە چۆن دەستیان بە بیرێکی یەکجار ناژیرانەی وەك ئەمەوە گرتووە و.. بۆ خۆت پەند وەربگرە!!

**بە کورتی:**

هەر پیتێك لە هەر پەڕاوێکدا، بە ئەندازەی تەنها "یەك" دانە پیت و بە شێوەیەکی دیاری کراو، خۆی دەناسێنێت و دەبێت بە بەڵگە لەسەر خۆی.. بەڵام بە ئەندازەی "دە" دانە پیت و لە چەند لایەکی جیا جیاوە، نووسەرەکەی خۆی دەناسێنێت و دەبێت بە بەڵگە لەسەری. بۆ نموونە دەڵێت : "نووسەرەکەم خەتی جوانە.. قەڵەمەکەی سوورە.. ئاوایە و.. ئاوایە... هتد ".

هەروەك پیتی نووسین بەم جۆرەیە، گشت پیتێکی ئەم پەڕاوە مەزنەی جیهانیش بە هەمان جۆرە، بە ئەندازەی قەبارەکەی (ماددەکەی) و بە قەدەر شکڵ و شێوەکەی، خۆیمان بۆ دەردەخات و دەبێت بە بەڵگە لەسەر "بوون"ی خۆی.. بەڵام بە ئەندازەی قەسیدەیەك ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری نەخشەکێش دەناسێنێت و، بە ئەندازەی شێوە و جۆرەکانی ناوە

جوانه‌كانیش ئـه‌و ناوانـه ده‌رده‌خـات و ئاماژه‌یـان بۆ ده‌كـات و شـایه‌تی له‌سـه‌ر خـاوه‌نی ئـه‌و ناوانه ده‌دات.

كه‌واته، ته‌نانـه‌ت ئـه‌و مرۆڤـه سۆفسـتائی‌یه گه‌وجـه‌ش كـه ئینكـاریی بوونـی خـۆی و سـه‌رجه‌می گـه‌ردوون ده‌كـات، نابـێ پێـی بـترازێت و دابه‌زێتـه ئاسـتی ئینكـاری كردنـی راستی‌یه‌كی ئاوا روونی چه‌شنی: "بوونی به‌دیهێنه‌ری شكۆمه‌ند"!

◆ **بریسكانه‌وه‌ی شه‌شه‌م:**

به‌دیهێنـه‌ری شـكۆمه‌ند هـه‌روه‌ك نیشـانه‌كانی "تـه‌نیایی" خـۆی لـه ناوچـاوانی هـه‌موو "تاك"ێكی به‌دیـهێنراوانی و، گشـت "جـوزء"ێكـی دروستكراوانی خـۆی داوه (ئـه‌وه‌بوو لـه بریسـكانه‌وه‌كانی پێشـوودا هـه‌ندێك لـه‌م نیشـانانه‌ت چاوپێ كـه‌وت).. هـه‌ر ئـه‌و به‌دیهێنـه‌ره شكۆمه‌نده، به شێوه‌یه‌كی روون و دره‌خشان گه‌لـێ نیشانه‌ی "ته‌نیایی" خـۆی له‌سـه‌ر گشـت "جـۆر"ێك و، چـه‌نده‌هـا مـۆری "یه‌كتایی"شـی له‌سـه‌ر روخسـاری هـه‌موو "كُـلّ"ێكـدا نه‌خشاندووه. ته‌نانه‌ت جۆره‌ها مۆری "ته‌نیایی" خۆی له سه‌رجه‌می جیهان داوه. خـۆ ئه‌گـه‌ر سه‌رنجی ته‌نها یه‌ك دانه له‌و "مۆر" و "نیشـانه" له‌ژماره‌به‌ده‌رانـه بده‌یـن كـه لـه وه‌رزی بـه‌هاردا به‌سه‌ر رووی زه‌وی‌یه‌وه ده‌نه‌خشێنرێن، بۆمان ده‌رده‌كه‌وێت كه: به‌دیهێنه‌ری نه‌خشه‌كێش لـه به‌هار و هاویندا پـتر لـه سێ سـه‌د هـه‌زار جـۆری رووه‌ك و زینـده‌وه‌ران لـه‌م رووی زه‌وی‌یـه‌دا به‌وپـه‌ڕی لێـك جیـابوون و تێكـه‌ڵ نـه‌بوون و رێكوپێكـی كـۆ ده‌كاتـه‌وه و ده‌یانخاتـه روو، هه‌رچـه‌نده‌ش "جـۆر"ه‌كانی ئه‌و رووه‌ك و زینده‌وه‌رانه تابڵێی تێكـه‌ڵ و پێكه‌ڵن و به تـه‌واوی ئاوێتـه‌ی یـه‌كترین! بـه‌م كـاره‌ش نیشـانه‌یه‌كی روونـاك و فراوانـی "یـه‌كتایی" خۆیمـان بـۆ ده‌رده‌خات كه هێنده‌ی به‌هار ئاشكرا و روون و له به‌رچاوه..

واته:

به‌دیهێنانی سێ سه‌د هه‌زار نموونـه‌ی رێكوپێكـی "حه‌شر" لـه ده‌می ژیاندنـه‌وه‌ی زه‌وی لـه وه‌رزی به‌هاردا..

هه‌روه‌ها نووسینی "تاك"ه تێهه‌ڵكێش بووه‌كانی سێ سه‌د هه‌زار "جـۆر"ی جیـاواز له‌سـه‌ر لاپه‌ڕه‌ی زه‌وی بێ هیچ هه‌ڵه و ناته‌واوی‌یه‌ك و به‌وپه‌ڕی هاوسه‌نگی و رێكوپێكی و كاملی..

بێ هیچ گومانێك، ئه‌مانه‌ی باس كران:

نیشـانه‌یه‌كی تایبـه‌تیی ئـه‌و كه‌سـه‌ن كـه به‌سـه‌ر هـه‌موو شـتێكدا زاڵ و ده‌سـته‌ڵاتداره و، جڵه‌وی "جیهانی په‌نهان" و گشت شتێكی به ده‌سته و، دانا و زانای راسته‌قینه‌یه.

ئەم نیشانەیەش هێندە ئاشکرا و لەبەرچاوە کە ئەگەر هەر کەسێك بە ئەندازەی یەك دانە گەردیلە خاوەنی هەست بێت پەیی پێ دەبات.

قورئانی پیرۆز ئەم نیشانە درەخشانەی لەم ئایەتەدا دەرخستووە کە دەفەرموێ:

**﴿فَانْظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللهِ كَيْفَ يُحْيِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِ الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾** (الروم: ٥٠).

بەڵێ، توانستی بەدیهێنەری دانا کە لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا و بە زیندووکردنەوەی ڕووی زەوی، سێ سەد هەزار نموونەی "حەشر"ی دەرخستووە، دەبێ حەشری مرۆڤی گەلێ بەلاوە ئاسان بێت. چونکە ئەگەر کەسێك ببێت کاری سەیر و دەراسا(خارق) ئەنجام بدات، وەك ئەوەی کە تەنها بە ئاماژەیەکی خۆی بتوانێت چیایەکی سەخت لە بێخ دەربهێنێت، ئایا کارێکی ڕەوایە گەر سەبارەت بەو کەسەوە بوترێت: "چۆن دەتوانێت ئەم بەردە گەورەیە لەسەر ڕێمان لاببات کە لەم شیوەدا ڕێی لێ گرتووین"؟! دیارە نەخێر، ئەم پرسیارە سەبارەت بەو خاوەن توانایە لە جێی خۆی‌دا نی‌یە و کارێکی ناڕەوایە.

بە هەمان جۆر، سەبارەت بە خوای گەورەی خاوەنی توانست و کەرەم و دانایی و میهرەبانیی ڕەهاوە کە لە ماوەی شەش ڕۆژدا ئاسمانەکان و زەویی بەدی هێناوە و دەم بە دەم ئەم زەوی و ئاسمانە پڕ دەکات و پاشان خاڵیشیان دەکاتەوە.. سەبارەت بەم خوایە، هەرگیز مرۆڤی "ژیر" پڕکێشیی ئەوە ناکات کە بە شێوازی بەدوورزانین(إستبعاد) بڵێت: (چۆن دەتوانێت ئەم چینە گڵەمان لەسەر لاببات کە ڕێی ڕۆشتنی لێ گرتووین بەرەو جێی میوانی‌یە هەتاهەتایی‌یەکەی)؟

ئەم نموونەیە، تەنها یەك دانەیە لە نیشانەکانی "یەکتایی" کە لە وەرزی بەهار و هاویندا بە ڕووی زەوی‌یەوە دەردەکەون. کەواتە بۆ خۆت لەم نموونەیەوە سەرنج بدە و بزانە کە چۆن بە ڕوونی مۆری "یەکتایی" بەسەر "بەڕێوەبردنی کاروباری" بەهاری یەکجار مەزنی سەرجەمی زەوی‌یەوە - بەوپەڕی دانایی و بینایی - دەردەکەوێت! چونکە ئەم کار ڕاپی کردنانەی کە لە بەهاردا جێ‌بەجێ دەکرێن و بە چاو دەبینرێن، لە ڕێکوپێکی‌یەکی ڕەها و.. بەدیهاتنێکی کامڵ و.. دروستکردنێکی تەواوی ناوازەدایە و.. لەگەڵ ئەوەشدا، بە فراوانی‌یەکی ڕەها و.. خێرایی‌یەکی ڕەها و.. سەخاوەتێکی ڕەهاش، ئەنجام دەدرێن.

ئایا ئیتر دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە دەرناکەوێت کە: ئەمانەی باس کران "مۆر"ێکی ئاشکرا و ڕوونی تەنها ئەو کەسەن کە خاوەنی زانستێکی نەبڕاوە و توانستێکی بێ‌سنوورە ؟

بەڵێ، ئێمە لە هەموو شوێن و لایەکی ئەم ڕووی زەوی‌یەدا: بەدیهێنان و، کار ڕاپی کردن و، کارایی(فعالیة)یەکی دەست‌بەکار، دەبینین کە:

بە فراوانیيەكی ڕەها ئەنجام دەدرێن و..

لەگەڵ ئەم فراوانیيەشدا، بە خێراییيەكی ڕەها جێبەجێ دەكرێن و..

لەگەڵ ئەم خێرایی و فراوانیيەشدا، سەخاوەتێكی ڕەهایان لە زۆربوونی "تاك"ەكانی دا لێ دەبینرێت و..

لەگەڵ ئەم سەخاوەت و فراوانی و خێراییيەشدا، ئاسانی و.. ڕێكوپێكیی ڕەها و.. داهێنانكاریی ناوازەیی سنعەت و.. لەیەك جیابوونەوەی تەواو لە یەك بە یەكیاندا دەبینرێن. هەر چەندەش تابلێی تێكەڵ و پێكەڵی یەكترین و بەیەكدا هەڵپرژاون.

هەروەها:

ئاسەواری تابلێی گرانبەها و.. دروستكراوانی یەكجار بەنرخ، لە هەموو شوێنێكدا دەبینرێن، هەرچەندەش ئەو ئاسەوار و دروستكراوانە لە زۆریدا لەسنوور بەدەرن..

"لەگەڵ یەك گونجان"ی تەواو، لە چوارچێوەیەكی یەكجار فراواندا و.. وردەكاری و ناوازەیی و، قەشەنگیی سنعەتیش، هەمیشە و لە هەموو لایەكدا بەرچاو دەكەون، وێڕای ئاسانیی لەڕادەبەدەریشیان!

بەڵێ، بەدیهێنانی هەموو ئەمانە، لە یەك كاتدا و.. لە گشت جێیەكدا و.. بە هەمان تەرز و شێوە و.. لە یەك بە یەكی "تاك"ەكاندا و.. هاودەم لەگەڵ: دەرخستنی ئەو سنعەتە دەراسا و ناوازەیە و، پیشاندانی ئەو كاراییيە دەراسا و دەستبەكارەدا..

بێ گومان ئەمانە "بەڵگە"یەكی ڕوون و "مۆر"ێكی تایبەتیی ئەو كەسەن كە "جێ و شوێن" ناتوانێت سنووری بۆ دابنێت و، لە هەموو شوێنێكدا حازر و ئامادەیە و، بینەر و، چاودێرە و، هیچ شتێكی لە لا شاراوە نییە و، چ كارێكیشی بەلاوە قورس نییە.. بەڵكو بەدیهێنانی گەردیلەكان و گەلەستێرەكان لە بەردەم توانستی ئەودا یەكسانن!

ڕۆژێكیان هێشووە ترێكانی قەدێكی لاوازی مێوێكم ژمارد كە بە ئەستووریی دوو پەنجە دەبوو. ئەو هێشووانەی كە - لە ڕاستیدا - موعجیزەی توانستی خواوەندی جوان و میهرەبانن و لە ڕەز و باخی كەرەمی خۆیدا پێشچاوی خستوون.. بینیم ئەو قەدە لاوازە، سەد و پەنجا و پێنج هێشووی گرتبوو! پاشان دەنكە ترێكانی یەك دانەم لەو هێشووانە ژمارد، سەد و بیست دەنكی پێوە بوو! ئنجا بیرم كردەوە و لەبەر خۆمەوە وتم:

ئەگەر ئەم قەدە باریك و لاوازە عەمباراوی شیلەی هەنگوین بوایە و، بەردەوام لەو شیلە ئاوەی بە دەنكەكانی ببەخشیبایە، ئەوا لە بەردەم ئەم گڕەی گەرمایەدا بەشی ئەو سەدان دەنكە ترێ پڕ لە شەكراوی میهرەبانیيەی نەدەكرد، لە كاتێكدا كە - ئەو قەدە باریكە - جگە لە: شێيەكی كەم نەبێ هیچی تری دەستگیر نابێت!

کەواتە ئەو کەسەی ئەم کارە ئەنجام دەدات، دەبێ بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانا و خاوەن دەستەڵات بێت. لەبەر ئەوە: "سبحان من تحير في صنعه العقول"!

◆ **بریسکانەوەی حەوتەم:**

هەروەك بە بیرکردنەوە و سەرنجدانێکی کەم، ئەو "مۆر" و "نیشانانە"ی خوای گەورەی "تەنیا" و "صەمەد"ت بینی کە لەسەر ڕووی زەوی دراون.. بە هەمان جۆر، سەریشت هەڵبڕە و چاوەکانت بکەرەوە و سەیرێکی کتێبی مەزنی گەردوونیش بکە!

دەبینیت:

بە ئەندازەی مەزنی و فراوانیی گەردوون مۆری "یەکتایی" بەسەر ڕوخساری گەردوونیشەوە نەخشاوە کە بە ڕوونی و ئاسانی دەخوێنرێتەوە!

چونکە ئەم بوونەوەرانە وەك: بەشەکانی کارگەیەکی ڕێکوپێك و.. گۆشە و سووچەکانی کۆشکێکی مەزن و.. لایەنەکانی شارێکی ئاوەدان وان، هەموو بەشێکی بوونەوەران: "پشتگیر"ی ئەوی تر و، دەستی یارمەتیی بۆ درێژ دەکات و، فریای ئەنجامدانی پێویستییەکانی دەکەوێت. هەموو بەشەکانیشی - بە گشتی - دەست لەناو دەست و، بە ڕێکوپێکیی تەواو بۆ خزمەتی "زیندەوەران" تێدەکۆشن و، پشتی یەکتری دەگرن و، تێکڕا ڕووەو ئامانجێکی دیاریکراو لە گوێڕایەڵی کردنی یەك کارسازی دانادا دەکەونە ڕێ!

بەڵێ، دەستووری: "یارمەتیدان و هاوکاری" کە بە ئاشکرا لە:

هاتوچۆی مانگ و خۆر و..

بەدوای یەکدا هاتنی شەو و ڕۆژ و..

بەرامبەروەستانی زستان و هاوینەوە..

دەستبەکارە و بە ڕوونی دەبینرێت.. تا دەگاتە:

بەدەمەوەچوون و یارمەتیدانی ڕووەك بۆ ئاژەڵی برسی و..

هەوڵدانی ئاژەڵ بۆ یارمەتیدانی مرۆڤی ڕێزلێگیراوی لاواز و..

گەیشتنی خێرا و بە پەلەی خۆراکەکان بە فریای منالە لاوازەکانەوە و..

فریاگوزاریی میوە ناسکەکان و..

خزمەتگوزاریی گەردیلەکانی خۆراك بۆ خانەکانی لەش..

هەموو ئەم جموجووڵانەی کە بەپێی دەستووری: "هاوکاری و یارمەتیدانی یەکتری" ئەنجام دەدرێن، دەری دەخەن (بۆ کەسێ کە بینایی دڵ و دەروونی بە تەواوی لەدەست نەدابێت) کە:

بە "هێز و دەستەڵاتی" پەروەردگارێكی تاك و تەنیای خاوەنی بەخشندەیی ڕەها و.. "فەرمانی" كارسازێكی تەنیا و خاوەن دانایی ڕەها، ئەنجام دەدرێن.

جا ئەم: پشتگیری و.. هاوكاری و.. بەدەمیەكەوە چوون و.. دەست لەملانێ و.. ڕامكردن و.. ڕێكوپێكی‌یەی كە هەمیشە لەم گەردوونەدا دەست بەكارن، شایەتی‌یەكی گومانبڕ دەدەن لەسەر ئەوەی كە: تەنها یەك كارساز هەموویان بەڕێوە دەبات و، یەك پەروەردگاریش گشتیان لەم گەردوونەدا بەرەو ئامانجەكانیان دەداتەبەر. زیاد لەمەش، ئەو دانستە گشتی‌یەی كە لە بەدیهێنانی شتە ناوازەكاندا بە ئاشكرا دیارە و.. ئەو چاودێری‌یە تەواوەی كە لەو دانستەدایە و.. ئەو میهرەبانی‌یە فراوانەش كە لەم چاودێری‌یەدا هەیە و.. ئەو ڕۆزی‌یە پەرش و بڵاوە زۆرەش كە بەم میهرەبانی‌یەوە دیارە و بەشی هەموو زیندەوەرێك دەكات و بەپێی پێداویستی‌یەكانی دەیڕژێنێت..

هەموو ئەمانە، "مۆر"ێكی هێندە مەزن و ڕوون و ئاشكرای "تەوحید"ن كە مەگەر كەسێك پشكۆی "ژیری"ی كوژابێتەوە و چاویشی تروسكایی لێ بڕابێت، دەنا بە جوانی دەیبینێت و پەیی پێ دەبات!!

بەڵێ، پەردەی "دانایی" كە: هەست و ویست و مەبەستی پێوە دەبینرێت و گشت پەراوێزەكانی بە شكۆمەندی نەخشێنراون، بە ڕووی سەرجەمی گەردووندا دراوە و..

پۆشاكی "چاودێری"ش كە: نەرمونیانی و ئارایشتدان و ڕازاندنەوە و چاكەكاریی لە ژێرەوە دەردەكەوێت، بە بەری ئەو پەردەی دانایی‌یەدا كراوە و..

بەرگی "میهرەبانی"ش كە: خۆ خۆشەویستكردن و خۆناساندن و نیعمەت بەخشین و ڕێز لێگرتنی لێ دەدرەوشێتەوە و سەرجەمی گەردوونی گرتووەتەوە، بەسەر ئەو پۆشاكی چاودێری‌یەدا دراوە و..

پۆشاكی "ڕۆزیدانی گشتی"ش بەسەر ئەو بەرگە ڕووناكەی میهرەبانیی گشتی‌دا ڕێز كراوە و، سفرە و خوانەكانی لە هەموو جێ‌یەكدا ڕاخراون، بە ڕادەیەك كە: بەزەیی و، چاكەكاری و، بەخشندەیی و، میهرەبانیی كامڵ و، پەروەردەكاریی باش و، نەرمونیانیی پەروەردگارێتی دەخەنە ڕوو.

بەڵێ، ئەم بوونەوەرانە، هەر لە گەردیلەكانەوە تا دەگاتە خۆرەكان، چ تاك و چ جۆر و چ بچووك و چ گەورە، پۆشاكێكی تابلێی ڕەنگین و جوانیان لەبەر كراوە كە لە پارچە و كووتاڵی "دانایی" چنراوە و پارچەكەش بە نەخش و نیگاری: بەرهەم و ئاكام و ئامانج و سوود و بەرژەوەندی‌یەكان ڕازێنراوەتەوە و.. ئنجا پۆشاكی "چاودێری"یان لەبەر كراوە، كە

ئەویش بە گوڵــزاری: لوتــف و چاکــەکاری نەخشــێنراوە و بــە ئــەندازەی بــاڵای هــەموو بوونـەوەرێك بڕراوە و بە بەری دووراوە و.. پاشـان نیشـانەکانی ئەو میهرەبانیی‌یەش کـە بـە ورشـــەی: خـــۆ خۆشەویســـتکردن و ڕێزلێنـــان و نیعمـــەت بەخشـــین و چاکـــەکاری دەدرەوشێنەوە، کراونەتە بەر ئەو پۆشاکی چاودێری‌یە و.. ئنجا لەسەر ئەو نیشـانە نەخشـین و ڕووناکەش سفرە و خوانی: "ڕۆزیدانی گشتی" بە درێژایی گۆی زەوی ڕاخراوە، بە ڕادەیـەك کـە هـەموو بـەش و جۆرەکـانی زینـدەوەران تـێر دەکـات و پێداویستی‌یەکانیان نـاهێڵێت و سەرجەمی خواستەکانیان ئەنجام دەدات.

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە ئەم چەشنە کارە، ئاماژەیەکی ڕوون و دیاری بە ئـەندازەی ئاشکرایی خۆر دەکات بۆ ئەو خواوەندەی کە: خاوەنی دانایی ڕەها و، بەخشـندەیی ڕەهـا و، میهرەبانیی ڕەها و، ڕۆزی‌بەخشینی ڕەهایە.

ئایا هەموو شتێك پێویستی بە "ڕۆزی" هەیە؟

بـەڵێ، هـەروەك بـە چـاوی خۆمـان دەبینـین کـە گشـت "تـاك" و "دانـە"یـەك پێویســتی بـە ڕۆزی‌یەکی ئەوتۆ هەیە بەردەوامی بە ژیانی ببەخشێت، بە هـەمان جۆر، گشـت بوونـەوەرانی ئـەم جیهانـەش چ "هەمـەکی" بن و چ "هـەندەکی" چ "کُلّ" بن و چ "جـوزء" هـەموویان بـۆ: قـەوارە و، مـانـەوە و، ژیـــان و، درێژەدانیش بـە ژیانیـان، چەندەهـــا داواکـاری و داخـوازیـی ماددی و مەعنەوی‌یان هەیە..

جا لـە کاتێکدا کە ئەو بوونەوەرانە تـا ئـەو ڕادەیـە دەستکورت و هـەژارن و پێویستیان بـە چەندان خواست و شتی زۆر و زەبەندەی ئەوتۆیە کە هەرگیز دەستیان بە نزمترینیـان ناگـات، تەنانـەت گـەر هـەموو هێزێکیشـیان بخەنـە کـار هێشـتا نـاتوانن بچووکـترین داخوازی‌یـان بهێننـەدی.. لــە کــاتێکدا ئـەوان بەرامبـەر هێنانـەدیی خواسـت و پێویسـتی‌یەکانیان ئـــاوا دەستکورت و بێ دەستەڵاتن، کەچی دەبینین (بێ ئەوەی بـە خـەیاڵیاندا هاتبێ و حسـابیان بـۆ کردبێـت و، بـە ڕێکوپێکی‌یـەکی تـەواوەتی و لـە کـاتی شـیاودا) سـەرجەمی ئـەو داخـوازی و ڕۆزی‌یە ماددی و مەعنەوی‌یانەیان تەسلیم دەکرێت، بە شێوەیەك کە لەگەڵ ژیانیاندا گونجـاو بێت و دانایی‌یەکی تەواویشیان پێوە دیار بێت!

ئایـا ئـەم هـەژاری و دەسـتکورتی‌یەی بوونـەوەران و.. پاشـان ئـەو جـۆرە یارمـەتی‌دان و فریاگوزاری‌یـە غەیبی‌یانـە، نـابن بــە "بەڵگــە" لەســەر پــەروەردگارێکی دانــای شــکۆمەند و کارسازێکی جوان و میهرەبان؟!

◆ **بریسكانەوەی هەشتەم:**

هەروەك چاندنی "تۆو" لە هەر "كێڵگە"یەكدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەو كێڵگەیە – وەك تۆوەكە – لە ژێر فەرمان و دەستەڵاتی خاوەنی تۆوەكەدایە..

بە هەمان جۆر:

هەمەكیبوونی ئەو تۆخمانەش كە وان لەناو كێڵگە و گشت بەشێكی زەویدا، هەرچەندەش ساكارن و لە هەموو شوێنێكدا هەر یەك تۆخمن..

هەروەها پەرش و بڵاویی بوونەوەرانی ڕووەك و زیندەوەران لە زۆربەی شوێنەكاندا – كە هەریەكەیان نموونەی بەری میهرەبانیی خوای گەورە و موعجیزاتی توانست و وشەی دانستی ئەون – هەرچەندەش لە هەموو شوێنێكدا هەن و لە یەك دەچن..

هەمەكیبوونی ئەو تۆخمانە و.. پەرش و بڵاویی ئەو بوونەوەرانە، بە ئاشكرا و ڕوونی، بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە هەموویان لە ژێر دەستەڵات و فەرمانی پەروەردگارێكی تاك و تەنیادان، بە ڕادەیەك دەڵێی هەموو "گوڵ" و "بەر" و "زیندەوەر"ێك، نیشانە و مۆر و تەمغەی ئەو پەروەردگارە بەخشندەیەن. چونكە گەر هەركام لەوانە بڕواتە هەر جێگایەك، بە زمانی حاڵ دەڵێت:

(ئەو كەسەی كە من نیشانەی ئەوم، ئەم زەوییەش دروستكراوی ئەوە و.. هەر كەسێكیش من "مۆر"ی ئەو بم، ئەم جێگایەش نووسراوی ئەوە و.. ئەو كەسەش كە من نیشانە و دروشمی ئەوم، ئەم شوێنەش چنراوی ئەوە)!

كەواتە "پەروەردگاریتی" لە ئاستی بچووكترین بەدیهێنراودا، تەنها بۆ ئەو كەسە ڕەوایە كە هەموو تۆخمەكان لە ژێر فەرمان و دەستەڵاتیدان و.. چاودێری كردنی بچووكترین گیانەوەریش تەنها لە توانای ئەو كەسەدایە كە لەناو دەستی پەروەردگارێتیی خۆیدا پەروەردەكردنی سەرجەمی زیندەوەران و ڕووەكەكانی بەلاوە ئاسانە!

ئەم ڕاستییە گەلێ ڕوونە بۆ ئەو كەسەی كە بینایی لەدەست نەدابێت!

بەڵێ، هەموو "تاك"(فرد)ێك بە زمانی: لەیەكچوونی لەگەڵ تاكەكانی تردا، دەڵێت :

(تەنها ئەو كەسەی كە بتوانێت خاوەنی هاوجۆرەكانم بێت، دەتوانێت خاوەنی منیش بێت، دەنا بۆی نییە خۆی بە خاوەنم دابنێت)!

هەموو "جۆر"(نوع)ێكیش بە زمانی: بڵاوبوونەوەی خۆی و گشت جۆرەكانی تر بەسەر زەویدا و.. گۆی "زەوی"ش بە زمانی پەیوەست بوونی خۆی و هەسارە گەڕۆكەكانی تر بە یەك خۆرەوە و پاڵدانەوەیان بە ئاسمانەكانەوە.. دەڵێت:

(تەنها ئەو کەسەی کە خاوەنی سەرجەمی گەردوون بێت، دەتوانێت خاوەنی منیش بێت. دەنا بۆی نیە خۆی بە خاوەنم بزانێت)!

خۆ ئەگەر یەك دانە "سێو" خاوەنی هەست و شعوور بێت و پێی بوترێت: "تۆ دروستکراوی منیت" ئەوا ئەو سێوە لەو کەسە ڕادەپەڕێت و پێی دەڵێت :

(بێدەنگ بە! گەر دەتوانیت هەموو سێوەکانی سەر ڕووی زەوی پێکبهێنیت.. بەڵکو گەر دەستەڵاتت دەڕوات بەسەر گشت ڕووەکە بەردارەکانی وەك ئێمە لە سەرانسەری زەویدا.. تەنانەت گەر بتوانیت دەستەڵاتت هەبێت لەو دیارییانەی خواوەندی میهرەباندا کە لە گەنجینەی میهرەبانییەوە دەیانبەخشێت، ئەو کاتە لافی پەروەردگاریتی بەسەر مندا لێ بدە)!!

ئەو سێوە، بەم وەڵامە، زللەیەکی توند و قایم لە دەموپلی ئەو گەوجە نەفامە دەوەشێنێت!

◆ **بریسکانەوەی نۆهەم:**

پێشتر ئاماژەمان بۆ چەندەها نیشانە و مۆر کرد کە بەسەر: "جوزء و جوزئی" و "کلّ و کوللی" و "جیهانی هەمەکی" و "ژیان" و "زیندەوەران" و "ژیان بەخشین"ەوە نەخشێنرابوون.. وا لێرەشدا ئاماژە بۆ یەك دانە لەو نیشانە لەژمارەبەدەرانە دەکەین کە بەسەر "جۆرەکان"ەوەن.

دەبینیت:

خەرجی و مەسرەفی بەرە زۆر و زەبەندەکانی درەختێکی بەردار، لە ڕوانگەی "تەوحید"ەوە هێندە ئاسانە کە لەگەڵ خەرجی و مەسرەفی یەك دانە بەردا یەکسان دەبێت کە چەندین دەستی زۆر و زەبەندە بەشدارییان لە پێگەیاندنیدا کردبێت!

چونکە ئەو درەختە بەردارە تەنها لە یەك مەڵبەندەوە و بە یەك پەروەردە کردن و یەك یاسا بەڕێوە دەبرێت. واتە: "زۆری" و "بوونی چەند مەڵبەندێك" بۆ بەڕێوەبردنی ئەو درەختە، داخوازی ئەوە دەبێت کە یەك بە یەکی بەرەکان (بە ئەندازەی پێداویستیی گشت بەرەکانی درەختێکی تەواو) پێویستیان بە خەرجی و مەسرەف و ئامێر بێت و، جیاوازی تەنها لە "نەوعییەت"دا بێت. بە وێنەی دروستکردنی تەقەمەنی و ئامادەکردنی کەرەسە سوپاییەکانی سەرباز، ئەوەتا گەر ئەم کارە بۆ هەموو سەربازێك بە جیا ئەنجام بدرێت، ئەوا بە ئەندازەی ئەو کارگانەی کە سەرجەمی سوپا پێویستی پێیان دەبێت، دەبێ کارگەی جۆراوجۆر بۆ ئەو تەنها سەربازە ئامادە بکرێت! چونکە گەر هەر کارێك لە دەستی: "تاکی"یەوە دەربچێت و

بکەوێتە دەستی "زۆری"یەوە، بە ئەندازەی ژمارەی یەك بە یەکی تاکەکان خەرجی و مەسرەف - لە ڕووی چەندایەتی‌یەوە - زیاد دەکات.

کەواتە ئەو ئاسانی‌یەی کە جێ‌دەستی بەسەر "جۆرەکان"ەوە بە ئاشکرا دیارە، تەنها هی ئەو ئاسانی‌یە زۆرەیە کە لە ڕێی: "تاك و تەنیایی"دا هەیە!

**پوختەی ئەم قسانە:**

هەروەك لەیەکچوون و لەگەڵ‌یەك گونجانی ئەندامە سەرەکی‌یەکانی "جۆرەکان"ی یەك "ڕەگەز" و "تاك"ەکانی یەك "جۆر" دەیچەسپێنێت کە ئەو تاك وجۆرانە بەدیهاتووی یەك بەدیهێنەرن.. بە هەمان جۆر، ئەو ئاسانی‌یە ڕەها و نەبوونی خەرجی و مەسرەفەش کە لە جۆرەکاندا دەبینرێن، تا ڕادەی: پێوستی(الوجوب) داخوازی ئەوەن کە هەموویان ئاسەواری یەك دروستکەر و بەدیهێنەر بن، چونکە "یەکبوونی": قەڵەم و سکە و مۆر، داخوازی ئەو دەرەنجامەن. دەنا ئەو چەشنە گیروگرفت و دژواری‌یانەی کە تا ڕادەی: نەهێشتن و نەگونجاوی(الإمتناع) لە بوارێکی ئاوەهادا خۆیان دەسەپێنن، سەرجەمی ئەو "ڕەگەز" و "جۆر"ەی بەرەو: "نەبوون" و "نەمان" بەرێ دەکرد!

**لەمانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

ئەگەر "بەدیهێنان" بدرێتە پاڵ خواوەندی "حەق" ئەوا بەدیهێنانی هەموو شتێك - لە ئاسانی‌دا - وەك بەدیهێنانی یەك دانە شت دەبێت و.. گەر بیشدرێتە پاڵ هۆکارەکان، گیروگرفتی هێندە زۆری دێنە پێش کە بەدیهێنانی یەك دانە شت بە ئەندازەی بەدیهێنانی هەموو شتان سەخت و زەحمەت و بە گیروگرفت دەبێت!

جا مادەم ڕاستی وایە، ئەوا ئەو زۆری و زەبەندەیی و بەپیتی‌یەی کە لە تاکەکانی هەموو جۆرەکانی ناو ئەم جیهانەدا بە چاو دەبینرێن، وەکو خۆری ڕووناکی ناوجەرگەی ئاسمان، نیشانەی "یەکتایی" خوای گەورە دەردەخەن.

کەواتە ئەگەر ئەم میوەجاتە زۆرانەی نۆشیان دەکەین، موڵکی یەك کەسی "تاك" و "تەنیا" نەبوونایە، هەرگیز نەماندەتوانی یەك دانە هەنار بخۆین، با سەرجەمی دنیاشمان بۆ دروستکردنی خەرج بکردایە!!

◆ **بریسکانەوەی دەهەم:**

هەروەك "ژیان" کە درەوشانەوەی جوانیی پەروەردگار ئاشکرا دەکات، بەڵگەی "تەنیایی" خوای گەورەیە، تەنانەت جۆرە درەوشانەوەیەکی "تاکیی" خوای گەورەیە.. بە هەمان جۆر "مردن"یش، کە درەوشانەوەی شکۆمەندیی خوای گەورە پیشان دەدات، بەڵگەی "یەکتایی" ئەو خواوەندەیە.

بۆ نموونە: گشت کەف و بلّقە ئاوەکان کە بەسەر ڕووبارێکی مەزنی ڕووبەڕووی خۆرەوە دەبریسکێنەوە.. هەروەها سەرجەمی مادده ڕووناك و بریسکاوەکانی سەر ڕووی زەوی.. هەموویان، شایەتێکی ڕاستگۆن لەسەر ئەو "خۆر"ەی کە لە بەرامبەریانەوەیە. چونکە وێنەی ئەو خۆرە پیشان دەدەن و تیشکی ڕووناکی‌یەکەی پەخش دەکەنەوە..

جا بەردەوامبوونی بریسکانەوەی ڕووناکیی خۆر - بێ هیچ ناتەواوی‌یەك - بەسەر دلّۆپە ئاو و مادده ڕوونە تازەهاتووەکانەوە، دوای نەمان و ئاوابوونی دلّۆپە ئاوەکانی پێشوو هەروەها نەمانی بریسکانەوەی مادده ڕوونەکان.. بەردەوامبوونی ئەم بریسکانەوانە، شایەتێکی گومانبڕە لەسەر ئەوەی کە: وردیلە خۆرەکانی پێشین و ئەو ڕووناکی‌یانەش پەخشیان دەکرد و دەیاندایەوە.. ئەو بوونەوەرانەی کە بەم جۆرەن و هەمیشە دەکوژێنەوە و پاشان سەرلەنوێ تازە دەبنەوە و ڕووناکی پەخش دەکەنەوە و ئالوگۆڕی بەردەوامیان بەسەردا دێت.. هەموو ئەمانە، تەنها بریسکانەوەی یەك خۆری: باقی و هەمیشەیی و بلّندی لەناونەچوون. کەواتە ئەو دلّۆپە بریسکەدارانە، بە: ڕۆیشتن و هاتن و دەرکەوتنی بەردەوامیان، بەلّگەن لەسەر: "بوون" و "یەکتایی" و "بەردەوامی"ی خۆر.

هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە (ولله المثل الأعلى) دەبینین کە: لێشاوی ئەم بوونەوەرانەی کە بە: "بوون" و "ژیان"ەکەیان شایەتی لەسەر: "پێویستیی بوون" و "تەنیایی" بەدیهێنەری مەزن دەدەن.. بە "نەمان" و "مردن"یشیان شایەتی لەسەر: "بوون" و "ئەزەلییەت" و "هەتاهەتایی" و "تەنیایی" بەدیهێنەریان دەدەن.

بەلّێ، هەروەك "نوێ بوونەوە"ی دروستکراوە ڕەنگین و بوونەوەرە ناسکۆلەکان، لە ناوەندی ئەم هەموو خۆرئاوابوون و خۆرهەلّهاتنانەدا و لە ئەنجامی ئالوگۆڕی شەو و ڕۆژ و زستان و هاوین و چەرخ و سەردەمەکانەوە، شایەتی لەسەر "بوون" و "مانەوە" و "یەکتایی" خوایەکی خاوەن جوانی و هەمیشەیی و پلە و پایە بەرز و خاوەنی درەوشانەوەی بەردەوام دەدات..

بە هەمان جۆر "مردن" و لەناوچوونی ئەو دروستکراوانەش، بەو هۆکارە ڕوالّەتی‌یانەی کە پێیان دەمرن، بێ‌نرخی و کۆلّەواریی ئەو هۆکارانەمان بۆ دەردەخات و، ڕوونی دەکاتەوە کە: ئەو هۆکارانە جگە لە پەردەی ڕووی دەستی توانستی خواوەند، هیچی تر نین.

ئەم بارودۆخەش بە جۆرێکی گومانبڕ ئاشکرای دەکات بۆمان کە: ئەم دروستکردن و بەدیهێنان و نەخش و نیگار کێشان و، درەوشانەوانە - لە ڕاستی‌دا - تەنها چەند دروستکراو و بەدیهێنراوێکی هەمیشە نوێ‌بووەوەی ئەو بەدیهێنەرە مەزنەن کە گشت

ناوه‌كانی ڕه‌نگین و جوان و پیرۆزن. ته‌نانه‌ت هه‌موو ئه‌وانه بریتین له‌: نه‌خشونیگاره بگۆڕ و ئاوێنه بزۆك و نیشانه یه‌ك له‌ دوای یه‌ك و مۆره هه‌میشه به‌ دانایی گۆڕراوه‌كانی ئه‌و به‌دیهێنه‌ره مه‌زنه.

**به‌ كورتی:**

هه‌روه‌ك ئه‌م په‌راوه‌ی گه‌ردوونی مه‌زن ئه‌و ئایه‌ته‌ ته‌كوینی‌یانه‌ی خۆیمان فێر ده‌كات كه‌ به‌ڵگه‌ی "بوون" و "یه‌كتایی" خوای گه‌وره‌ن.. به‌ هه‌مان جۆر، شایه‌تییش له‌سه‌ر هه‌موو سیفه‌ته‌كانی كه‌ماڵ و جوانی و شكۆمه‌ندیی زاتی مه‌زنی په‌روه‌ردگار ده‌دات و، له‌ هه‌مان كاتیشدا كه‌ماڵی زاته مه‌زن و خاوێن و دوور له‌ ناته‌واوی‌یه‌كه‌یمان بۆ ده‌چه‌سپێنێت..

چونكه هه‌روه‌ك ئاشكرایه گه‌ر "كه‌ماڵ" له‌ هه‌ر ئاسه‌وار و جێ‌ده‌ست و شوێنه‌وارێكدا ده‌ربكه‌وێت، ئه‌وا ده‌بێت به‌ به‌ڵگه‌ی كه‌ماڵی ئه‌و "كار"ه‌ی كه‌ سه‌رچاوه‌ی ئه‌و كه‌ماڵه‌یه.. كه‌ماڵی ئه‌و كاره‌ش كه‌ماڵی "ناو"ه.. كه‌ماڵی ناویش به‌ڵگه‌ی كه‌ماڵی "سیفه‌ته‌كان"ه.. كه‌ماڵی سیفه‌ته‌كانیش به‌ڵگه‌ی كه‌ماڵی "كاروباری زات"ه و.. كه‌ماڵی كاروباری زاتیش – به‌ ڕوونی و حه‌دس[1] و پێویستی – به‌ڵگه‌ی ئه‌و زاته خاوه‌ن كاروبارانه‌یه!

بۆ نموونه: نه‌خش و نیگاری ورد و ئارایشت و جوانكاریی ناوازه‌ی كۆشكێكی ته‌واو ڕه‌نگین، به‌ڵگه‌ی "كار"ه ته‌واوه‌كانی وه‌ستای به‌ننای كارامه‌یه كه‌ له‌ پشتی ئه‌و نه‌خش و نیگارانه‌وه هه‌ستیان پێ ده‌كرێت..

كه‌ماڵ و ڕێكوپێكیی ئه‌و كارانه‌ش، ته‌واوكاری و كامڵیی "ناوه‌كان"ی هه‌موو پله‌ و پایه‌ و ناونیشانه جۆراوجۆره‌كانی ئه‌و به‌ننا خاوه‌ن كاره ده‌رده‌بڕن..

كامڵ بوونی ناو و ناونیشانه‌كانیش، كامڵیی چه‌ند سیفه‌تێكی له‌ژماره‌به‌ده‌ری ئه‌و سنعه‌تكاره ده‌خه‌نه پێش‌چاو له‌ ڕووی سنعه‌ته‌كه‌یه‌وه..

كامڵ بوون و ناوازه‌یی ئه‌و سنعه‌تانه‌ش، شایه‌تن له‌سه‌ر كامڵیی توانا و لێهاتنه زاتی‌یه‌كانی ئه‌و سنعه‌تكاره، كه‌ پێیان ده‌وترێ: "كاروباری زاتی"..

كامڵ بوونی ئه‌م كاروبار و لێهاتنه زاتی‌یانه‌ش به‌ڵگه‌ی كامڵیی چییه‌تی(ماهیـــة)ی سنعه‌تكاره‌كه‌یه!

به‌ هه‌مان جۆر، ئه‌و سنعه‌ته ناوازه و بێ خه‌وش و دوور له‌ ناته‌واوی‌یه‌ش كه‌ ئاسه‌وار و جێ‌ده‌سته‌كانی له‌ جیهان و له‌م بوونه‌وه‌ره ڕێكوپێكانه‌ی گه‌ردووندا به‌ ئاشكرا ده‌بینرێن و،

(١) "حه‌دس" : له‌ لاپه‌ڕه‌ (٢٦٠)دا واتاكه‌ی ڕابورد. (وه‌رگێڕ)

کە ئایەتی پیرۆزی: ﴿هَلْ تَرى مِنْ فُطُورٍ﴾یش (الملك:٣) سەرنجی مرۆڤی بۆ لا ڕاکێشاون، بە ئاشکرا و بینین بەڵگەن لەسەر:

کەماڵی "کار"ەکانی کاریگەر(مؤثر)ێکی خاوەن توانستی ڕەها.. ئەو کەماڵی کارەش - بە زەروورەت و بەداهەت - بەڵگە و شایەتە لەسەر کەماڵی "سیفەتەکان"ی خاوەنێکی جوانی ئەو ناوانە.. ئەم کەماڵی سیفەتانەش دەبێ بە بەڵگە و شایەتێکی دڵنیاییبەخش لەسەر: کەماڵی "سیفەتدار"ێکی خاوەن کەماڵ.. ئەم کەماڵی سیفەت و کاروبارانەش تا ڕادە و ئەندازەی پلەی "حق الیقین" بەڵگەیە لەسەر کەماڵی "زات"ێکی خاوێن و پاکی خاوەن کاروبار، بەڵگەیەکی ئەوتۆ کە هەرچی "کەمالات" لەناو گەردووندا دەبینرێن تەنها سێبەرێکی لاواز و کوژاوەن - ولله المثل الأعلى - سەبارەت بە: نیشانەکانی کەماڵ و، هێماکانی شکۆمەندی و، ئاماژەکانی جوانیی ئەو!

◆ **بریسکانەوەی (خۆرئاسای) یازدەهەم:**

لە "وتەی نۆزدەهەم"دا ئەو ڕاستییە بە خوێنەر ناسێنرا کە:

مەزنترین ئایەتی ناو کتێبی گەورەی گەردوون و.. گەورەترین ناو لەو قورئانە مەزنەدا و.. تۆوی درەختی گەردوون و.. ڕووناکترین بەروبوومەکانی ئەو درەختە و.. خۆری کۆشکی ئەم جیهانە و.. مانگی چواردە و ڕووناکیبەخشی جیهانی ئیسلام و.. ڕێ پیشاندەری خەڵکی بۆ لای دەستەڵاتداریی پەروەردگارێتیی خوای گەورە و.. دانای نهێنی دەرخەر و شیکەرەوەی گشت نهێنی و مەتەڵەکانی بوونەوەران، تەنها سەروەرمان حەزرەتی محەممەدی ئەمینە ﷺ کە سەرجەمی پێغەمبەرانی لە ژێر باڵی پێغەمبەراتییەکەیدا و هەموو "جیهانی ئیسلامی"شی لە ژێر باڵی ئایینی ئیسلامدا جەم کردووە و، بەم دوو باڵەوە بەناو چینەکانی "حەقیقەت"دا فڕیوە و، بووە بە ڕابەر و سەرقافڵەی کاروانی: هەموو پێغەمبەران و گشت ئەولیا و صیددیقان و سەرجەمی زانایانی لێکۆڵەر و دڵ خاوێن و، بەوپەڕی ئەو توانا و هێزەش کە خوا پێی بەخشیوە "یەکتایی" خواوەندی بە جوانی ڕوون کردووەتەوە و بەمەش ڕێیەکی تەخت و ئاسانی بەرەو عەرشی "تەنیایی" خستووەتە سەرپشت و، ڕێنمایی گرۆی مرۆڤی لە ڕێی: "ئیمان بە خوا"دا گرتووەتە ئەستۆ و، "یەکتایی ڕاستەقینە"ی چەسپاندووە..

ئایا دەبێ ئیتر چ وەهم و دوودڵییەك بتوانێت ئەو ڕێگا ڕوون و تەخت و ئاسانە لە مرۆڤایەتی بگرێت یان لە بەرچاوی خەڵکیدا دابپۆشێت؟!

جا لەبەر ئەوەی ئێمە لە "وتەی نۆزدەهەم" و "مەکتووبی نۆزدەهەم"دا ئەو بەڵگە گومانبڕە ژیان بەخشەمان بە چوارده "نم" و نۆزده "ئاماژە" لەگەڵ ڕوونکردنەوەی

جۆرەكانی موعجیزاتی ئەودا چەسپاندووە، ئەوا لێرەدا تەنها بەم ئاماژەیە دەست لە باسەكە هەڵدەگرین و، بە پێشكەش كردن و ناردنی صەلات و سەلام بۆ ئەو بەڵگە ڕووناكەی "یەكتایی"، باسەكەمان كۆتایی پێ دەهێنین.. صەلات و سەلامێك كە ئاماژە بۆ بناغەكانی تەزكیە كردنی ئەو دەكەن و شایەتی بۆ ڕاستگۆیی ئەو دەدەن:

اللهم صل على من دل على وجوب وجودك ووحدانيتك، وشهد على جلالك وجمالك وكمالك.. الشاهد الصادق المصدق والبرهان الناطق المحقق.. سيد الأنبياء والمرسلين، حامل سر إجماعهم وتصديقهم ومعجزاتهم.. وإمامُ الأولياء والصديقين الحاوي سر إتفاقهم وتحقيقهم وكراماتهم، ذو المعجزات الباهرة والخوارق الظاهرة والدلائل القاطعة المحققة المصدقة له.. ذو الخصال الغالية في ذاته، والأخلاق العالية في وظيفته، والسجايا السامية في شريعته المكملة المنـزهة عن الخلاف، مهبط الوحي الرباني بإجماع الْمُنْزِل والْمُنْزَل والْمُنَزَّل عليه.. سيار عالم الغيب والملكوت.. مشاهد الأرواح ومصاحب الملائكة.. أنموذج كمال الكائنات شخصاً ونوعاً وجنساً.. أنور ثمرات شجرة الخلقة، سراج الحق، برهان الحقيقة. تمثال الرحمة، مثال المحبة، كشاف طلسم الكائنات، دلال سلطنة الربوبية، المرمز بعلوية شخصيته المعنوية إلى أنه نصب عين فاطر العالم في خلق الكائنات.. ذو الشريعة التي هي بوسعة دساتيرها وقوتها تشير إلى أنها نظام ناظم الكون ووضع خالق الكائنات.

نعم، إن ناظم الكائنات بهذا النظام الأتم الأكمل هو ناظم هذا الدين بهذا النظام الأحسن الأجمل، سيدنا نحن معاشر بني آدم ومهدينا إلى الإيمان نحن معاشر المؤمنين، محمد بن عبدالله بن عبدالمطلب عليه أفضل الصلوات وأتم التسليمات ما دامت الأرض والسموات. فإن ذلك الشاهد الصادق المصدق يشهد على رؤوس الأشهاد، منادياً ومعلماً لأجيال البشر خلف الأعصار والأقطار، نداءً علوياً بجميع قوته وبغاية جديته وبنهاية وثوقه وبقوة اطمئنانه وبكمال إيمانه:

"أشهد أن لا إله إلاّ الله وحده لا شريك له".

◆ **بریسكانەوەی (خۆرئاسای) دوازدەهەم:**

ئەم بریسكانەوەی دوازدەهەمەی "وتەی بیست و دووهەم" دەریای هەموو ڕاستییەكانە. بەڵام چۆن دەریایەك؟.. دەریایەكی هێندە مەزن كە هەر بیست و دوو وتەكانی پێشوو تەنها بیست و دوو دڵۆپی ئەون.. ئنجا سەرچاوەی گشت ڕووناكییەكانیشە، سەرچاوەیەكی ئەوەندە گەورە كە هەر بیست و دوو وتەكانی پێشوو تەنها بیست و دوو بریسكانەوەی ئەو خۆرە ڕووناكیبەخشەن..

بەڵێ، هەموو یەکێك لە بیست و دوو وتەکانی پێشـوو تەنـها یـەك درەوشـانەوەی ئەسـتێرە گەشەی تەنها یەك ئایەتن کە لـە ئاسمـانی "قورئـانی پـیرۆز"دا پرشـنگ دەدەن و.. دڵۆپێکـن لـە ڕووباری ئایەتێك لە دەریای "قورئانی پیرۆز"ەوە سەرچاوەیان گرتـووە و.. مرواریـیەکن لـە سندووقی گەوهـەرەکانی تەنـها یـەك ئایـەتی ئـەو "پەڕاوەی خـوای گـەورە" کـە لـە ڕاستیدا بریتییە لە گەنجینەی هەرە مەزنی ئەو خواوەندە!

لەبەر ئەوە، چواردەهەمین "نم"ی وتـەی نۆزدەهـەم تەنـها چەردەیـەك بـوو لـە پێناسـەی ئـەو گوفتارە خواییە مەزنەی کە لـە: ئیسـمی ئەعزەم.. لـە عەرشـی ئەعزەم.. لـە درەوشـانەوەی هەرە مەزنی پەروەردگارێتیی هەرە مەزنەوە، بـە فراوانـی و بەرزیـیەکی ڕەهـا، نـازڵ بـووە و، ئەزەلی بە ئەبەدەوە و.. فەرشـی بە عەرشــەوە پەیوەست کردووە و.. هەر ئـەوە کـە بـە هـەموو توانا و هێزێکی خۆی و بێ گومانیی ئایەتەکانی: ﴿**لا إلـــه إلاّ هـــو**﴾ دووپـات دەکاتـەوە و سەرجەمی گەردوونیشی لەسەر دەگرێت بە شایەت!

بەڵێ ڕاستە، هەموو جیهان پێکەوە بە یەك دەنگ "لا إله إلا هو" دەڵێن..

خۆ ئەگەر بە بینایی دڵ و دەروونێکی ساغ سەیری ئـەو قورئانـە پـیرۆزە بکـەیت، دەبینیـت کە هەر شەش "لا"کانی: درەخشانە.. ڕووناکی بەخشـە.. ڕوونـە.. ڕەوانـە. بـە ڕادەیـەك کـە هەرگیز هیچ جـۆرە تـاریکی و گومـان و گومڕایـی و فێڵێـك نـاتوانێت کـەلێن و کەلەبـەرێك بدۆزێتەوە تا خۆی بەناو حەرەمی خاوێنی ئایەتەکانی ئەو قورئانە پیرۆزەدا بکات!

چونکە لای سەرەوەی: دروشمـی ئیعجـازە و.. لای خـوارەوەی: بەڵگەیـە و.. پشتەوەشـی (واتە خاڵی پشت پێ بەستنی): "وەحی"ی بێ گەرد وخاوێنی پـەروەردگارە و.. بەردەمیشـی: بەختەوەریی هەردوو دنیایە و.. لای ڕاستیشی: عـەقڵانی هێناوەتـە قسـە و گوفتـار بـۆ تەسـدیق کردنـی و.. لای چەپیشــی: شــایەتیدان و تەســلیم بوونــی ویژدانــە کــە ڕاســتییەکانی دەچەسـپێنێت و.. ناوەوەشـی، بـە ڕوونـی و بێ گومـانی: هیدایـەتی خـاوێن و بێ گــەردی خــواوەندی میهرەبانـە و.. سـەرەوەشـی، وەك بـەچـاو دەبینـرێت: نــوورە بێ گــەردەکانی ئیمانــە و.. بەروبوومەکانیشــی: ئــەو زانــا دڵ و دەروون خــاوێن و لێکۆڵــەر و پیاوچــاك و صیدیقانەن کە بە "عين اليقين" هەرچی کەماڵاتی مرۆڤانـە هـەن تیایـاندا جـەمبووە و پێیانـەوە پرشنگی داوە.

جا ئەگەر بە باشی گوێت بنێیت بە سنگی ئەو زمانەی جیهانی غەیبەوە (واتە قورئان) ئەوا بێ هیـچ گومـانێك، لـە قووڵایـی ناخیـەوە، زایەڵەیـەکی ئاسمــانیی خــەمڕەوێنی بـەچێژ و تـام دەبیستیت کە لەوپەڕی جیدییەت و بەرزیدایە و، بە "بەڵگە" پڕچەك کراوە و، هەمیشـە و بـە

قه‌تعي‌یه‌تێكی ته‌واو ﴿لا إله إلاّ هو﴾ دووپات ده‌كاته‌وه! به ڕاده‌یه‌كی ئه‌وتۆ كه ئه‌و وته‌یه‌ی قورئانی پیرۆز به "حق الیقین" دووپاتی ده‌كاته‌وه، تا پله‌ی "عین الیقین"، "علم الیقین" به دڵت ده‌به‌خشێت!

**پوخته‌ی ئه‌م قسانه ئه‌وه‌یه كه:**

پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ و.. قورئانی دانای پیرۆز، هه‌ریه‌كه‌یان نوورێكی ڕوون و دره‌خشانن، یه‌ك ڕاستی‌یان ئاشكرا كردووه، ئه‌ویش "ڕاستیی ته‌وحید"ه..

ئه‌م دوانه، یه‌كێكیان: زمانی جیهانی بینراوه(عالم الشهادة) كه به په‌نجه‌كانی "ئیسلام" و "پێغه‌مبه‌رایه‌تی" ئاماژه‌ی بۆ ئه‌و ڕاستی‌یه كردووه و، به ڕوونی و به گشت هێزێكی و له ڕێی هه‌زار موعجیزه‌ی خۆی و به سه‌لماندنی هه‌موو پێغه‌مبه‌ران و سه‌رجه‌می ئه‌صفیاكانه‌وه، ڕاستیی "ته‌وحید"ی چه‌سپاندووه..

ئه‌وی دیكه‌یان: وه‌ك زمانی جیهانی په‌نهان(عالم الغیب) وایه و، هه‌مان ڕاستیی ده‌رخستووه و، به په‌نجه‌كانی "حه‌ق" و "هیدایه‌ت" ئاماژه‌ی بۆ كردووه و، به‌وپه‌ڕی جیدییه‌ت و ڕه‌سه‌نایه‌تی و له ڕێی چل دانه ئیعجازی خۆی و به سه‌لماندنی گشت ئایه‌ته ته‌كوینی‌یه‌كانی گه‌ردوون، ئه‌و ڕاستی‌یه‌ی خستووه‌ته ڕوو. ئایا ئیتر ئه‌و "ڕاستی"یه له خۆر ڕووناكتر و، له ڕۆژی ڕۆشنایش ئاشكراتر نی‌یه؟!

* * *

ده‌سا ئه‌ی مرۆڤی بووده‌ڵه‌ی سه‌رسه‌ختی نوقمبووی ناو لیتاوی گومڕایی![1]

چۆن ده‌توانیت به تروسكایی كز و بێ‌تینی ناو كه‌لله‌ی خۆت لاسایی ئه‌و خۆرانه بكه‌یته‌وه؟ یان چۆن ده‌توانیت واز له‌و خۆرانه بهێنیت و پێویستت پێیان نه‌بێت و، ده‌ته‌وێت به فووی ده‌م بیانكوژێنیته‌وه؟

ده‌ك زه‌ره‌رمه‌ندی و ڕسوایی بۆ خۆت و عه‌قڵی سه‌رپێچی‌كار و سه‌رسه‌ختت!.. چۆن ئینكاریی ئه‌و گوفتاره ده‌كه‌یت كه زمانی: "جیهانی په‌نهان" و زمانی: "جیهانی بینراو" به ناوی په‌روه‌ردگاری عاله‌میان و خاوه‌نی هه‌موو گه‌ردوونه‌وه ڕایان گه‌یاندووه؟ چۆن ئینكاریی ئه‌و بانگه‌وازه ده‌كه‌یت كه ئه‌و دوو زمانه بانگیان بۆ هێشتووه؟

ئه‌ی به‌دبه‌ختی له مێش كۆڵه‌وار و بێ‌نرختر!

ده‌بێ تۆ خۆت به چی بزانیت وا خۆت گرفتاری به‌درۆخستنه‌وه‌ی ئه‌و خواوه‌نده به‌ڕێز و شكۆمه‌نده ده‌كه‌یت كه خاوه‌نی موڵكی ئه‌م گه‌ردوونه فراوانه‌یه؟!

---

(١) ڕووی ده‌می ئه‌م گوفتاره ئاراسته‌ی ئه‌و كه‌سه كراوه كه هه‌وڵی دا قورئان له‌ناوبه‌رێت! (دانه‌ر)

# کۆتایی

ئەی هاوڕێی خاوەن "ژیری"ی ڕووناك و "دڵ"ی بێدار!

گەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، لەم وتەی بیست و دووهەمە گەیشتوویت، ئەوا فەرموو بە یەك جار هەر دوازدە بریسکانەوەکان بکە بە چەپکێك و بیگرە بە دەستتەوە و لەکیسی خۆتی مەدە و، بە چرایەکی "حەقیقەت"ی ئەوتۆی بزانە کە لە هێز و ڕووناکیی هەزاران چرادایە.. دەست بە ئایەتەکانی ئەو قورئانە مەزنەوە بگرە کە لە "عەرشی ئەعزەم"ەوە نازڵ بوون.. سواری بوراقی تەوفیق ببە و.. بە ئاسمانی "ڕاستییەکان"دا سەر بکەوە و.. بۆ عەرشی ناسینی خوای گەورە بەرز ببەرەوە و، بڵێ:

"أشهد أن لا إله إلاّ أنت وحدك لا شريك لك".

پاشان لەناو ئەم مزگەوتە مەزنەی جیهاندا و، لە بەرچاوی سەرجەم بوونەوەرانی گەردووندا "یەکتایی" خوای گەورە ڕابگەیەنە و بڵێ:

(لا إله الاّ الله، وحده، لاشريك له، له الملك، وله الحمد، يحيي، ويميت، وهو حيّ لا يموت، بيده الخير، وهوعلى كلّ شيء قدير).

﴿**سبحانك لا علم لنا إلاّ ما علّمتنا إنّك أنت العليم الحكيم**﴾ (البقرة:٣٢).

﴿**ربّنا لا تؤاخذنا إن نسينا أو أخطأنا ربّنا ولا تحمل علينا إصراً كما حَمَلْتَهُ على الذين من قبلنا ربنا ولا تُحَمِّلْنا ما لا طاقةَ لنا به واعفُ عنا واغفر لنا وارحمنا أنت مولانا فانصرنا على القوم الكافرين**﴾ (البقرة:٢٨٦).

﴿**رَبَّنَا لا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّاب**﴾ (آل عمران:٨).

﴿**ربنا إنّك جامعُ الناسِ ليومٍ لا ريبَ فيه إنّ الله لا يخلفُ الميعاد**﴾ (آل عمران:٩).

اللهم صل على من أرسلته رحمة للعالمين وعلى آله وصحبه أجمعين وارحمنا وارحم أمته برحمتك يا أرحم الراحمين. آمين.

﴿**وآخر دعواهم أن الحمد لله رب العالمين**﴾ (يونس:١٠).

# وتەی بیست و سێهەم

## ئەم وتەیە بریتی‌یە لـە دوو باس

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۞ ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ ۞ إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ (التين: ٤-٦)

## باسی یەکەم

**(لـە نێوان هەزاران لایەنی جوانیی "ئیمان"دا، تەنها پێنج دانـەیان لــە ناوەندی پێنج خاڵدا، ڕوون دەکەینەوە).**

● **خاڵی یەکەم:**

مرۆڤ بەهۆی ڕوونـاکیی ئیمانـەوە بـەرەو بڵندتریـن "پلـە" بـەرز دەبێتـەوە. بەمـەش نـرخ و بایەخێکی ئەوتۆی دەست دەکەوێت کە وای لـێ دەکات شایانی بەهەشت بێت. بەڵام ئەگەر ڕێی کوفر بگرێتەبەر، ئەوا بەهۆی ئەو تاریکی‌یەی کە لەو ڕێگایـەدا هەیـە، بـەرەو نزمـترین پلـە دادەبەزێتە خوارەوە و دەکەوێتە بارێکی ئەوتۆ کە وای لـێ دەکات شیاوی دۆزەخ بێت.

هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە "ئیمان" بە پەیوەستێکی قایم و پتەو، مرۆڤ بـە خـوای خۆیەوە دەبەستێت و، پەیوەندیی لەگەڵ خوای گەورەدا بۆ پەیدا دەکات. چونکـە ئیمـان، لـە ڕاســتی‌دا، پـەیوەندی پەیداکردنـە لەگـەڵ خـوای گـەورەدا. لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ بـەهۆی ئیمانەوە و لەو ڕووەوە کـە: "سنعەتی خـوای کردگـارە و، نیشـانەی نـەخش و نیگـاری نـاو جوانەکانی پەروەردگاری تێدا دەردەکەوێت"، ئەوا نرخ و ڕێزێکی تابڵێیت گەورەی دەست دەکەوێت.

بەڵام کوفر ئەو پەیوەندی و نیسبەت پەیدا کردنە دەبچڕێت و، تاریکی‌یەکەشی ئەو سنعەتەی خواوەندی کردگار دادەپۆشێت و نایهێڵێت. بەم کارەشی لە نرخی مرۆڤ دادەگرێت و تەنها لە لایەنە ماددی‌یەکەی‌دا دەیهێڵێتەوە. خۆ ماددەش، لەبەر ئەوەی شتێکی فانی و لەناوچووە و ژیانیشی کاتی‌یە، ئەوا بایەخی بۆ دانانرێت و وەك "نەبوو" وایە.

وا ئەم نهێنی‌یە بە نموونەیەك ڕوون دەکەینەوە:

نرخی ماددە لەچاو نرخی سنعەتی مرۆڤ و مەودای چاکیی ئەو سنعەتەدا جیایە. ئەوەتا هەندێ جار دوو نرخەکە یەکسانن و، جاری وایش دەبێت کە ماددە لە خودی سنعەتەکە بەنرختر دەبێت و، هەندێ جاریش ماددەیەکی ئاسن نرخێکی هونەری و جوانکاریی تابلێیت بەرزی دەبێت و، هەندێ جاری تریش سنعەتێکی زۆر نایابی دەگمەن نرخی ملیۆنان لیرەی دەست دەکەوێت، با لە ماددەیەکی زۆر سادە و ساکاریش بێت. خۆ ئەگەر ئەم سنعەتە نایابە ببرێتە بازاڕی پیشەسازە وریا و لێزانەکان و، وەستا لێهاتووە کارامە و ناودارەکەشی بناسن، ئەوا نرخی دەگاتە یەك ملیۆن لیرە. هەر هەمان سنعەتی نایاب گەر - بۆ نموونە - ببرێتە بازاڕی ئاسنگەران، لەوانەیە هیچ کەسێك نەیکڕێت. بەڵکو لەوانەیە هەر هیچ کەسێك لێی نەچێتە پێشەوە.

مرۆڤیش بە هەمان جۆرە! سنعەتی نایابی خواوەندی کردگارە و، بەرزترین و ناسکترین موعجیزەی توانستی پەروەردگارە. چونکە خواوەندی کردگار کردوویەتی بە: پیشانگای دەرخستنی هەموو درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خۆی و، خولگەی هەموو نەخش و نیگارە بێ وێنەکانی و، نموونەیەکی پوخت و بچووکی گشت بوونەوەران.

جا ئەگەر نووری ئیمان لەم مرۆڤەدا جێگیر ببێت، ئەوا ئەو نوورە سەرجەم نەخش و نیگارە پڕ لە دانایی‌یەکانی خواوەند لە مرۆڤدا، دەردەخات و دەیشیانخاتە بەردەستی خەڵکی تاکو بیانخوێننەوە. ئیتر مرۆڤی ئیماندار بیریان لێ دەکاتەوە و، دەیانخوێنێتەوە و، لە خۆی‌دا بە تەواوی هەستیان پێ دەکات و، کەسانی تریش وا لێ‌دەکات کە ئەوانیش بیانخوێننەوە. واتە: وەك ئەوە وایە بڵێت: "من دروستکراو و بەدیهێنراوی کردگاری مەزنم. بڕوانن چۆن چاکە و میهرەبانیی ئەوم تێدا دەردەکەوێت". بەم واتایانە و هاوچەشنیان سنعەتی پەروەردگار لە مرۆڤدا دەردەکەوێت و بەرجەستە دەبێت.

کەواتە ئەم ئیمانەی کە بریتی‌یە لە پەیوەندی پەیدا کردن لەگەڵ خواوەندی کردگاردا، هەموو شوێنەوارەکانی سنعەتی ئەو کردگارە لە مرۆڤدا دەردەخات. ئیتر تا ئەو سنعەتەی

پەروەردگار دیارتر و ئەو ئاوێنەیەی کردگاریش بریقەدارتر بێت، نرخی مرۆڤ زیاتر دەردەکەوێت. ئەم مرۆڤەی کە لە ڕواڵەتدا گرنگیی‌یەکی ئەوتۆی نی‌یە، بەم ئیمانە وای لێ دێت کە پلەی هەرە بەرزی نێوان بەدیهێنراوان بەدەست بهێنێت، چونکە بەمە شایانی گوفتاری خواوەند و، شەرەفمەندی میوانیی پەروەردگار دەبێت لە بەهەشتدا.

بەڵام ئەگەر کوفر – کە لە ڕاستی‌دا پەیوەندی پچڕاندنە لەگەڵ خواوەنددا – دەستی بگاتە دڵی مرۆڤ، ئەوا ئەو کاتە هەرچی واتا و ناوەرۆکی نەخش و نیگارە پڕ لە دانایی‌یەکانی ناوە جوانەکانی خواوەند هەن، هەموویان دەکەونە تاریکی‌یەوە و نامێنن. ئنجا خوێندنەوەیان مەیسەر نابێت. چونکە ئەو کاتە بە بۆنەی لەبیرچوونەوەی کردگار لە لایەن ئەو مرۆڤەوە، هیچ‌کام لەو لایەنانەی مرۆڤ کە دەڕوانە کردگاری مەزن، نازانرێن، بەڵکو پشت هەڵدەکەن و، زۆربەی نیشانەکانی سنعەتی بەنرخی پڕ لە واتا و نەخش و نیگارە مەعنەوی‌یە بەرزەکانیش، نامێنن و لەناودەچن. ئەوانەشیان کە دەمێننەوە و بەچاو دەبینرێن، ئەوا دەدرێنە پاڵ هۆکارە بێ‌بایەخەکانی وەك "سروشت" و "ڕێکەوت". ئیتر بەم جۆرە هیچ کام لەو نیشانە بەنرخانە نامێنن. چونکە ئەو کاتە هەریەکە لەو گەوهەرە درەوشاوانە دەبن بە شووشەیەکی ڕەش و تاریك و، نرخ و بایەخی تەنها لە ماددە ئاژەڵ ئاساکەی‌دا دەمێنێتەوە. خۆ وەك وتمان: نرخ و بەها و بەروبوومی ماددەش لەوەدایە خاوەنەکەی، کە لە هەموو بەدیهێنراوان دەستکورت و بەدبەخت‌ترە، ژیانێکی هەندەکیی کەم و کورت بباتە سەر، ئنجا لە کۆتایی‌دا نامێنێت و دەڕوات.

بەم جۆرە، "کوفر" چییەتی(ماهیة)ی مرۆڤ دەڕووخێنێت و، لە گەوهەرێکی بەنرخەوە دەیگۆڕێت بە خەڵووزێکی بێ نرخ!

● **خاڵی دووهەم:**

هەروەك "ئیمان" ڕووناکی‌یەکی وایە مرۆڤ ڕووناك دەکاتەوە و، هەموو نووسراوەکانی خوای گەورەی تێدا بەرجەستە دەکات و، دەیانخاتە بەرچاوی بینەر و خوێنەران.. بە هەمان جۆر، گشت بوونەوەرانیش ڕووناك دەکاتەوە و، چەرخەکانی پێشوو و ئایندەش لە تاریکی ڕزگار دەکات.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم نهێنی‌یە، نموونەیەك دەهێنینەوە و، لەمەشدا پشت بە یەکێك لە نهێنی‌یەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەبەستین کە دەفەرموێ:

﴿اللهُ وليُّ الَّذينَ آمَنُوا يُخرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُماتِ إلى النُّورِ﴾ (البقرة:٢٥٧).

لە ڕووداوێکی ئەندێشەیی‌دا دوو چیای سەختی بەرزم دی کە بەرامبەری یەکتر بوون و، پردێکیش سەر لوتکەی هەردووکیانی بە یەکەوە بەستبوو. ژێر پردەکەش شیوێکی قووڵ بوو.

منیش لەسەر ئەو پردە ڕاوەستابووم و، دنیاش لە هەموو لایەکەوە هێندە تاریکی دایپۆشیبوو کە بە تەواوی شت نەدەبینرا!

ئاوڕم بە لای ڕاستی خۆمدا دایەوە، گۆڕستانێکی گەورەم لە تاریکاییەکی بێ سنووردا دی. واتە وام بە خەیاڵدا هات..

پاشان سەیری لای چەپم کرد. وەك بڵێیت چەندین شەپۆلی سەختی وام دی کە پڕ بوون لە کارەساتی گەورە و سەرسووڕهێنەر و لەوەدا بوون هێرشم بۆ بهێنن و پەلامارم بدەن..

سەیری ژێر پردەکەم کرد، قووڵاییەکی بێ بنك هاتە بەرچاوم!

منیش بۆ ئەم هەموو تاریکایی‌یانە تەنها چرایەکی دەستیی کزم پێبوو، کە خستمەکار، بارێکی سامناکم بەدی‌کرد! چونکە لە هەموو جێیەکدا، تەنانەت لەم لا و لەو لا و ئەوسەری پردەکەشدا چەندین تارمایی و جڕوجانەوەر و شێر و دڕندەم دی. خۆزگەم دەخواست ئەو چرایەم هەر نەبوایە کە ئەو هەموو بوونەوەرە سامناکانەی بۆ دەرخستم! چونکە ڕووناکیی چراکەم بۆ هەرلایەك ئاراستە بکردایە، هەمان سامناکیم دەبینی. لە دەروونەوە خەمی زۆرم خوارد و بەدەم خەفەتەوە وتم: "ئەم چرایەم لێ بوو بەهۆی گیروگرفت". ئیتر ڕقم لێی هەڵسا و فڕێم دا و شکا! کە فڕێم دا بەر سویچی گڵۆپێکی کارەبایی مەزن کەوت! لە پڕ ئەم گڵۆپە داگرسا و هەموو بوونەوەرانی ڕووناك کردەوە و، پەردەی تاریکیی لادا و بە یەکجاری نەما و، ئەو ڕووناکی‌یە هەموو لایەکی گرتەوە و، ڕاستی و حەقیقەتی هەموو شتێك بە جوانی و ڕوونی دەرکەوت.

بینیم ئەو پردە هەڵواسراوە سامناکە، شەقامێکە لەناو دەشتاییەکدا.. گۆڕستانە مەزنەکەی لای ڕاستیش چەند کۆڕێکی زیکر و تەهلیلە و ڕێز و خزمەتگوزاری و خواپەرستین کە بە سەرپەرشتی و لە ژێر چاودێریی چەند مرۆڤێکی نوورانی‌دان لە چەندین باخچەی سەوز و جواندا کە خۆشی و ڕووناکی‌یان تێدا دیارە و بەختەوەری و خۆشی بە دڵان دەبەخشن.. ئەو شیوە قووڵ و کارەساتە سەرسووڕهێنەر و ڕووداوە سەیرانەی لای چەپیش، چەند چیایەکی پڕ لە درەختی سەوزی جوانن کە مرۆڤ پڕ بەدڵ حەز دەکات سەیریان بکات و، لە پشتی ئەم چیا و شاخانەشەوە میوانخانەیەکی مەزن و باخچە و سەیرانگایەکی دڵڕفێنی لێیە.

بەڵێ، بە خەیاڵ وام دی..

ئەو بوونەوەرە سامناك و جڕوجانەوەرە دڕندانەش کە لە پێشدا بینیمن، لە ڕاستی‌دا چەند زیندەوەرێکی ماڵی و ڕامکراوی وەك حوشتر و مانگا و بزن و مەڕ بوون.

ئیتر لەم كاتەدا ئەم ئایەتەم خوێندەوە كە دەفەرموێ:

﴿اللهُ وليُّ الَّذينَ آمنُوا يُخرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُماتِ إلى النُّورِ﴾.

ئنجا لەبەر خۆمەوە وتم:

"الحمد لله على نور الايمان".

پاشان لەو ڕووداوە ئەندێشەیی‌یە بێدار بوومەوە.

ئەو دوو چیایە: سەرەتا و كۆتایی ژیانن، واتە جیهانی سەر زەوی و بەرزەخن. پردەكەش: ڕێگـای ژیانـە. لای ڕاسـت: سـەردەمی ڕابـوردووە و، لای چـەپیش: ئایندەیـە. ئـەو چـر دەستی‌یەش: خۆویستیی مرۆڤە كـە بـە خـۆیدا دەنـازێت و، شـانازی بـە زانیاری‌یەكانیـەوە دەكـات، ئـەو زانیاری‌یانـەی كـە بـە جۆرێكـی وان گـوێ بـۆ سرووش(وەحـی)ی خواوەنـد ناگرن. دڕندە و جڕوجانەوەرەكانیش: بوونەوەر و ڕووداوە سەیر و سەرسووڕهێنەرەكانن.

جا ئەو مرۆڤەی كە پشت بە خۆویستی و لەخۆبایی‌بوونی خۆی دەبەستێ و دەكەوێتـە نـاو داوی تـاریكیی بێ‌ئاگـایی و، دووچـاری كـۆت و زنجیری كوشـندەی گومڕایـی بـووە، ئـەو كەسـە، وەك حاڵـەتی یەكـەمی ڕووداوە ئەندێشـەیی‌یەكەی مـن وایـە. چونكـە لـە ڕووناكی‌یـە كزەكـەی ئـەو چرایـەدا، كـە زانیـاریی لـەڕێ‌لادەر و ناتـەواوی گومڕایی‌یـە، ڕابـوردوو وەك گۆڕستانێكی گەورەی تاریك دەبینێت و، ئایندەشی هێندە تاریك دێتە بـەرچاو، كـە سـەرجەم كارەساتە ناخۆشەكانی تێدا دێـن و دەڕۆن و، هـەموو ئـەم كارانـەش دەداتـە دەستی ڕێكـەوتی كتوكوێر. بوونەوەران و ڕووداوەكانیش، كـە هەریەكـەیان فەرمانبـەری گوێڕایـەڵن لـە لای پەروەردگارێكی دانای میهرەبان، ئەو بە دڕندەی خوێن مژیان دەزانێت. كەواتە فـەرمانی ئـەم ئایەتە پیرۆزەی لەسەر دەسەپێت كە دەفەرموێ:

﴿والَّذينَ كَفَرُوا أَوْلِياؤُهُم الطَّاغُوتُ يُخرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إلى الظُّلُماتِ﴾ (البقرة:٢٥٧).

بەڵام ئەگەر ڕێنمایی خواوەند بەدەم مرۆڤەوە بێت و، ئیمان ڕوونـاكیی خـۆی بـە دڵـی ئـەو مرۆڤە بگەیەنێت و، فیرعەونایەتیی دەروونی بشـكێت و، گـوێ بـۆ قورئـانی پـیرۆز ڕابگرێـت. ئەوا ئەو مرۆڤە، وەك حاڵەتی دووهەمی ڕووداوە ئەندێشەیی‌یەكەم وایە، هەموو بوونەوەران لە بەرچاویدا ڕوون دەبنەوە و وەك ڕۆژی ڕووناكیان لـێ دێت و، هەموو جیهان بە یـەك دەنـگ دەڵێن:

﴿اللهُ نُورُ السَّمواتِ والأَرضِ﴾ (النور:٣٥).

ئیـتر ئـەو كاتانـەی ڕابـوردوو گۆڕستانێكـی گـەورە نـابن (وەك وای بـە خـەیاڵدا دەهـات) بەڵكو هەریەكە لە چەرخەكانی ڕابوردوو – وەك بە بەسیرەت (بینایی دڵ) دەبینرێت – پڕە لـە

ئەرك و فەرمانبەریی بەندایەتی بە پێشەوایەتیی یەكێك لە پێغەمبەران، یان چەند كەسێك لە خواناسان. چونكە هەر یەك لەمانە ئەو فەرمانبەرییە بەرزە بە جوانترین و تەواوترین شێوە بەڕێوە دەبات و بلاوی دەكاتەوە و لەناو خەڵكیدا پایە و بنچینەكانی دادەمەزرێنێت. پاشان كە ئەم حەشاماتە زۆر و ڕۆح پاكانە كار و ئەركی سروشتی و فەرمانبەریی ژیانیان كۆتایی پێ دێت، بەرەو چەندین پلەی بڵند بە "الله أكبر"وتنەوە، دەڕۆن و بەرز دەبنەوە و دەچنە ئەودیو پەردەی ئایندەوە.

هەر ئەم مرۆڤە كە ئاوڕ بە لای چەپدا دەداتەوە، بە دووربینی ئیمان لە دوورەوە و لە پشتی چەندین ئالوگۆڕی بەرزەخ و قیامەتەوە، كە وەك چیاكان مەزنن، چەندین كۆشكی بەختەوەریی ناو باخچەكانی بەهەشت دەبینێت، كە میوانداریی خواوەندی میهرەبانی بە چەشنێكی فراوانی بێ كۆتایی تێدا ساز كراوە. بەمە دڵنیا دەبێت كە هەرچی كارەساتی گەردوونیی وەك زریان و بوومەلەرزە و تاعوون و هاوچەشنیان هەن، هەر هەموویان كار پێسپێرراو و فەرمانبەری گوێڕایەڵن. ڕەشەبای بەهار و باران و هاوچەشنیان كە لە ڕواڵەتدا ناشیرین و خەمناك دیارن، ئەم بە ڕاستی دەیانبینێت و بۆی دەردەكەوێت كە ئەوانە مایە و خولگەی چەندین دانایی ورد و جوانن، بە ڕادەیەك كە مردن بە پێشەكیی ژیانێكی هەتاهەتایی و، گۆڕیش بە دەرگای بەختەوەریەكی هەمیشەیی دەبینێت.. لاكانی تر بۆ خۆت لەگەڵ ئەم نموونەیەدا بەراورد بكە و لێكیان بدەرەوە.

● **خاڵی سێهەم:**

"ئیمان" هەروەك "ڕووناكی"یە، بە هەمان جۆر "هێز"یشە. چونكە ئەو مرۆڤەی كە ئیمانی تەحقیقیی دەست دەكەوێت، دەتوانێت پشت بە ئیمانەكەی ببەستێ و بەرهەڵستی گشت بوونەوەران بكات و لە تەنگانەی ڕووداوەكان ڕزگاری ببێت. ئیتر بەوپەڕی دڵنیاییەوە سواری كەشتیی دەریابڕی ناو شەپۆلە سەختەكانی ژیان دەبێت و، بێ ترس و بیم دەڕوانێتە دەوروبەری و دەڵێت: "توكلت على الله" و، ئەركە قورسەكانی ئەستۆی بە ئەمانەت دەداتە دەستی توانستی خاوەن تواناى ڕەها كە خوای گەورەیە. بەم جۆرە، بە دڵنیایی و ئاسانی و ئاسوودەییەوە ڕێی ژیانی دنیا دەبڕێت تا دەگاتە بەرزەخ، لەوێ دەحەوێتەوە. ئنجا دەتوانێت لەوێوە بەرز ببێتەوە و بەرەو بەهەشت بفرێ و بڕواتە ناو بەختەوەریی هەمیشەییەوە. بەڵام ئەگەر مرۆڤ بەو جۆرە پشتی بە خوای گەورە نەبەست، ئەوا نەك هەر ناتوانێ بفڕێت، بەڵكو ئەو كۆڵە قورسانەی ژیان زیاتر قورسی دەكەن و بەرەو نزمترین پلە كێشی دەكەن.

کەواتە "ئیمان" داخوازی "تەوحید"ە و، تەوحیدیش مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەوەی خۆی "تەسلیم"ی خواوەند بکات و، ئەم خۆ تەسلیمکردنەش "تەوەککول" واتە: پشت بەخوابەستن، دەهێنێتە دی. ئنجا تەوەککولیش ڕێگا بۆ "بەختەوەریی" هەردوو دنیای مرۆڤ ئاسان دەکات.

وا گومان نەبەیت کە تەوەککول دەست داتەکاندنە لە هۆکارەکان بە تەواوی، نەخێر.. بەڵکو بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤ بزانێت هۆکارەکان چەند پەردەیەکن بەسەر ڕووی دەستی توانای خوای گەورەدا دادراونەتەوە، دەبێ چاودێری بکرێن. ئەم چاودێری کردن و دەست پێوەگرتنەش جۆرە نزا و پاڕانەوەیەکی عەمەلی‌یە لە خوای کردگار. کەواتە، پاش ئەمە، داوای هاتنەدیی ئەنجامەکان تەنها لە خواوەند دەکرێت و، سوپاسگوزاری و ستایش تەنها بۆ ئەوە و بەس.

ئەو مرۆڤەی پشت بەخوا دەبەستێت و ئەوەش پشتی پێ نابەستێت، وەك دوو پیاو وان کە هەر یەکەیان کۆڵی یەکجار قورسی لەکۆڵ نا و، بلیتیان بڕی و سواری کەشتی‌یەکی مەزن بوون. هەرکە سەرکەوتن، یەکێکیان کۆڵەکەی خۆی دانا و لەسەری دانیشت و چاودێریشی دەکرد. ئەوی تریان ئەوەندە لەخۆبایی و نەفام بوو، ئەمەی نەکرد. پێیان وت:

– (کۆڵە قورسەکەت دابنێ، با بۆ خۆت بحەوێیتەوە)!

– وتی: (نەخێر، کاری واناکەم.. دەترسم کۆڵەکەم لەناوبچێت.. من خۆم بەهێزم.. گوێ بە کۆڵ هەڵگرتن نادەم.. چی بە کۆڵمەوەیە دایناگرم)!

بۆ دووهەم جار پێیان وت:

– (کاکی برا! ئەم کەشتی‌یە میری‌یە ئەمینەی ئێمەی تێدایین، لە هەموومان بەهێزترە و دەتوانێت لە ئێمە زیاتر پارێزگاریی خۆمان و شتومەکمان بکات. دوور نی‌یە لە هۆشی خۆت بچیت و خۆت و کۆڵت بکەونە ناو دەریاکەوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە تۆ وردە وردە وزە و توانات نامێنێت و بێهێز دەبیت، پشتی لاواز و ئەستۆی بێهێزت لەمە زیاتر توانای هەڵگرتنی ئەو کۆڵەیان نی‌یە کە دەم بەدەم لە قورسبووندایە. خۆ ئەگەر کەشتیوان بەم شێوەیە بتبینێت بە شێتت دەزانێ و دەرتدەکات و دەڵێت: ئەمە خیانەتکارە، کەشتی‌یەکەمان تاوانبار دەکات و گاڵتەمان پێدەکات. ئیتر بەم جۆرە و بەهۆی ئەم خۆ بە گەورە زانینەی کە لە ڕاستی‌دا لاوازیی تێدا شارراوەتەوە – وەك مرۆڤی خاوەن بەسیرەتی بینا دەیبینن – و بەم لەخۆبایی بوونەشت کە کۆڵەواریی تێدایە و، بەم مەرایی کردنەش کە ڕیاکاری و زەلیلیی لە دووتوێدایە، بەمانە، خۆت دەکەیت بە گاڵتەجاڕی خەڵکی و مایەی

پێکەنین و گاڵتەوگەپیان. نابینیت هەموان بۆت دەڕوانن و بە کەم سەیرت دەکەن و پێت پێدەکەنن)؟!

ئەم هەژارە، دوای ئەوەی ئەم گوفتارەی بیست، ژیریی هاتەوە بەر و، کۆڵەکەی داگرت و لەسەری دانیشت و، وتی:

(سوپاس بۆ خوای گەورە.. خوا لێت ڕازی بێت، لە ماندوویی و سووکی و بەندی و گاڵتەی خەڵك، ڕزگارت کردم).

دەسا ئەی ئەو مرۆڤەی کە لە "پشت بەخوا بەستن"ەوە دوورە!

تۆیش وەك ئەم پیاوە ژیریت بهێنەرەوە بەر و، پشت بە خوای گەورە ببەستە، تاکو لە دەست: پێویستی و، دەست پان کردنەوە لە بەردەم بوونەوەراندا و، ترس و بیم لە هەموو ڕووداوێکدا، دەرباز ببیت و.. خۆت لە ڕیاکاری و، گاڵتەی خەڵك و، بەدبەختیی هەمیشەیی و، کۆت و زنجیری تەنگ پێهەڵچنینی ژیانی دنیا، ڕزگار بکەیت.

● **خاڵی چوارەم:**

"ئیمان" لە ڕاستیدا مرۆڤ دەکات بە "مرۆڤ"، بەڵکو دەیکات بە پادشای بوونەوەران! لەبەر ئەوە، کارمەندی و فەرمانبەریی سەرەکیی مرۆڤ "ئیمان بوونە بەخوا و پاڕانەوەیە لێی".. بەڵام کوفر مرۆڤ دەکات بە ئاژەڵێکی دڕندەی بێتوانا و دەستەوسان.

وا لێرەدا و لە نێوان هەزاران بەڵگەدا، یەك دانە بەڵگەی ڕوون و بێ گومان لەسەر ئەم مەسەلەیە دەهێنینەوە. ئەو بەڵگەیەش بریتییە لە: جیاوازیی هاتنەدنیای مرۆڤ لەچاو ئاژەڵدا..

بەڵێ، جیاوازیی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ لە هاتنە دنیایاندا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ تەنها بە "ئیمان" دەگاتە پلەی مرۆڤایەتیی ڕاستەقینە. چونکە کاتێ ئاژەڵ دێتە دنیا، وا دێت وەك بڵێیت لە جیهانێکی تردا کامڵ کرا بێت. دەبینیت بەپێی توانای خۆی، بە تەواوی و کاملی دەنێررێتە دنیا. ئەوەتا لە ماوەی دوو سەعات، یان دوو ڕۆژ، یان دوو مانگدا هەموو مەرجەکانی ژیان و، پەیوەندییەکانی بە بوونەوەرانی ترەوە و، یاساکانی ژیانی فێر دەبێت و ئەمەش بۆی دەبێت بە بەهرەیەکی بەردەوام. بۆ نموونە: "چۆلەکە" یان "هەنگ" لە ڕێی ئیلهام و ڕێنمایی خواوەندەوە، فێری توانا و هەڵسوکەوتی ژیان دەبێت و، لە ماوەی بیست ڕۆژدا ئەوەندە شت فێر دەبێت کە مرۆڤ مەگەر بە بیست ساڵ ئنجا دەستی بکەوێت! چونکە ئەرك و کارمەندیی سەرەکیی ئاژەڵ بریتی نییە لە خۆ پێگەیاندن و کامڵ بوون و بەرزبوونەوە بەهۆی فێربوونی زانستەوە و، پاڕانەوە و داواکردنی یارمەتیش نییە بەهۆی

ده‌ربڕینی ده‌سته‌وسانی و كۆڵه‌واری‌یه‌وه‌. به‌ڵكو فه‌رمانبـه‌ری و ئه‌ركی سـه‌ره‌كی و ڕاستیی ئاژه‌ڵ ئه‌نجامدانی ئه‌و كارانه‌یه‌ كه‌ له‌ توانایدایه‌. واته‌: به‌ندایه‌تیی عه‌مه‌لی‌یه‌.

به‌ڵام مرۆڤ به‌ پێچه‌وانه‌وه‌یه‌، كاتێ دێته‌ دنیا پێویستی بـه‌ زانینـی هـه‌موو شتێكه‌. چونكـه‌ هیچ شتێك له‌ یاساكانی ژیان نازانێت، ته‌نانه‌ت هی وا هه‌یه‌ لـه‌ مـاوه‌ی بیسـت سـاڵدا هـه‌موو مه‌رجـه‌كانی ژیـانی فێر نـابێت، بـه‌ڵكو له‌وانه‌یـه‌ بـه‌ درێژایـی ته‌مـه‌نی پێویسـتی بــه‌ زانسـت و فێربوون بێت.. ئه‌مه‌ سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه‌ كاتێ دێته‌ دنیا له‌وپه‌ڕی لاوازی و كۆڵه‌واری‌دایـه‌، به‌ ڕاده‌یه‌ك كه‌ دوای دوو ساڵ ته‌مه‌ن ئنجا ده‌توانێت له‌سه‌ر پێ ڕابوه‌ستێ و، لـه‌ دوای ته‌مـه‌نی پـازده‌ سـاڵی‌یه‌وه‌ نـه‌بێت له‌وانه‌یـه‌ چـاك و خـراپ و سـوود و زیـان لــه‌ یـه‌ك جیانه‌كاتـه‌وه‌ و، ناتوانێت سوود و به‌رژه‌وه‌ندی‌یه‌كانی ژیان بۆ خۆی بهێنێته‌دی و زیانه‌كانیشی له‌ خۆی دوور بخاته‌وه‌، گه‌ر له‌ ژیانی كۆمه‌ڵایه‌تیی مرۆڤدا به‌شدار نه‌بێت.

له‌مه‌وه‌ ئـه‌وه‌ ڕوون ده‌بێتـه‌وه‌ كـه‌ فه‌رمانبـه‌ریی سروشـتیی مـرۆڤ خـۆ كامڵ‌كردنـه‌ بـه‌ دوو شت: بـه‌ "فێربوون" واتـه‌ سـه‌ركه‌وتن و به‌رزبوونـه‌وه‌ لـه‌ ڕێـی ده‌ستخسـتنی زانسـت. بـه‌ "پاڕانه‌وه‌"ش له‌ ڕێی به‌ندایه‌تی‌یه‌وه‌. واته‌ به‌وه‌ی مرۆڤ له‌ خۆی‌دا هه‌ست بكات و بپرسێت:

(ئایا من به‌ میهره‌بانی و به‌زه‌یی كێ ئاوا به‌م جۆره‌ چاودێری‌یه‌ دانایانه‌ چاودێری ده‌كرێم؟! به‌ سه‌خاوه‌ت و به‌خشـنده‌یی كـێ بـه‌م پـه‌روه‌رده‌ ئاوێزانـه‌ی سـۆز و میـهره‌بانی ئـاوا پـه‌روه‌رده‌ ده‌كرێم؟! به‌ چاكه‌ و به‌خشایشی كێ وا به‌م شێوه‌ ڕۆزی‌دانه‌ نه‌رمونیانه‌ ڕۆزیم پێ ده‌درێت)؟!

ئه‌م مرۆڤه‌ ئیمانداره‌ ده‌بینێت فه‌رمانبـه‌ریی ڕاسته‌قینه‌ی له‌وه‌دایـه‌ كـه‌ بـه‌ زمـانی هـه‌ژاری و كۆڵه‌واریی خۆی، له‌ خواوه‌ندی فریادڕه‌س بپاڕێته‌وه‌ و، به‌ نزا و لالانه‌وه‌ش پێداویستی‌یه‌كانی لـێ داوا بكات. تاكو ئه‌و داواكاری و پێداویستی‌یانه‌ی كه‌ ئـه‌م ده‌سـتی بـه‌ یـه‌ك لـه‌ هـه‌زاریان ناگات، ئه‌و خواوه‌نده‌ هه‌موویانی بۆ ئه‌نجام بدات و بیانهێنێته‌دی. ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌ ده‌گه‌یه‌نێت كه‌ كارمه‌ندی و فه‌رمانبه‌ریی سه‌ره‌كیی مرۆڤ: فڕین و به‌رزبوونه‌وه‌یه‌ به‌ دوو باڵی "كۆڵه‌واری و هه‌ژاری" به‌ره‌و پله‌ی به‌رزی "به‌ندایه‌تی".

كه‌واته‌ بۆیه‌ مرۆڤ هێنراوه‌ته‌ ئه‌م جیهانه‌، تاكو به‌ "زانین" و "پاڕانـه‌وه‌" پێ‌بگـات و كـامڵ ببێت. چونكه‌ به‌پێی چییه‌تی و توانایی مرۆڤ، هه‌موو شتێكی ڕووی له‌ زانسته‌ و هۆگریـه‌تی. بناغه‌ و كانگا و ڕووناكی وگیانی هه‌موو زانستێكی ڕاسته‌قینه‌ش "ناسینی خوای گـه‌وره‌"یـه‌. هه‌روه‌ك بناغه‌ی ئه‌م بناغه‌یه‌ش "باوه‌ڕبوونه‌ به‌ خوای گه‌وره‌".

جا لـــه‌به‌ر ئـه‌وه‌ی مـرۆڤ لـه‌ ژیـاندا دووچـاری چـه‌ندین جـۆری لـه‌ژماره‌ بـه‌ده‌ری گیروگرفت و هێرش هێنانی دوژمنانی ده‌بێـت، چونكه‌ له‌وپـه‌ڕی كۆڵه‌واری‌دایـه‌ و.. چـه‌ندین

داواکاری و پێداویستیی زۆریشی هەن لەگەڵ ئەوەشدا لەوپەڕی هەژاریدایە.. ئەوا لەبەر ئەوە، فەرمانبەریی سروشتی و سەرەکیی ئەو، لە دوای "ئیمان"، "پاڕانەوە"یە. چونکە کاکڵە و بناغەی پەرستن پاڕانەوەیە. هەروەك مناڵ کە لە هێنانەدیی ئاواتەکانی و ئەنجامدانی مەبەستەکانیدا، کە دەستی پێیان ناگات، دەستەوسان و کۆڵەوارە و، ناچار پەنا دەباتە بەر گریان یان داوای مەبەستەکەی دەکات. واتە بە زمانی بێتوانایی و کۆڵەوارییەکەی - چ بە دەم چ بە کردەوە - دەپاڕێتەوە و، لەم ڕێیەشەوە بە مەرامەکەی دەگات..

مرۆڤیش کە نەرمونیانترین و هەژارترین و کۆڵەوارترینی زیندەوەرانە، وەك ئەو منالە لاوازە وایە، چار نییە دەبێ هانا بەرێت بۆ لای خواوەندی میهرەبان و، یان بە گریان -کە لاوازی و کۆڵەوارییەکەی دەردەبڕێت - یان بە پاڕانەوە - کە هەژاری و پێویستییەکانی دەگەیەنێت - خۆی بهاوێتە بەردەستی. بەمەش شوکرانەبژێریی ئەو بەدەنگەوەهاتن و فریاکەوتن و کار بۆ ئاسانکردنانەی خواوەند ئەنجام دەدات. دەنا گەر مرۆڤ وەکو منالی لەخۆبایی نەفام بڵێت: "من دەتوانم ئەم هەموو شتانە ژێردەست بخەم و، بە بیرکردنەوەی خۆم بەسەریاندا زاڵ ببم" کە لە ڕاستیدا هەزاران جار لە سەرووی توانا و وزەی خۆیەوەن، ئەم کارە - لە ڕاستیدا - ناشکوری کردنی نیعمەتەکانی خواوەندە و، تاوانێکی گەورەیە و دژی سروشتی مرۆڤایەتییە و، دەبێت بەهۆی ئەوەی کە خۆی شایانی سزایەکی سەخت بکات.

● **خاڵی پێنجەم:**

هەروەك ئیمان داخوازی "نزا و پاڕانەوە"یە و، دەیکات بە هۆیەك لە نێوان ئیماندار و خوای خۆیدا و.. هەروەك سروشتی مرۆڤیش بەوپەڕی توندی داخوازیەتی و تابڵێیت ئارەزوومەندیەتی.. هەروەك ئەمە وایە، خوای گەورە خۆیشی داوای هەمان شت لە مرۆڤ دەکات و دەفەرموێ: "ئەگەر دوعاکانتان نەبێت ئێوە چ بایەخێکتان هەیە"؟:

﴿**قُلْ ما يَعْبَؤُ بِكُمْ رَبِّي لَولا دُعاؤُكُمْ**﴾ (الفرقان:٧٧).

﴿**أُدعوُنـــي أَستَجِبْ لَكُم**﴾ (غافر:٦٠).

ئەگەر بڵێیت:

(زۆر جار ئێمە لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە، بەڵام پاڕانەوەکانمان گیرا نابن، هەرچەندەش ئەم ئایەتە گشتییە و بە ڕوونی و ئاشکرا دەفەرموێ: هەموو پاڕانەوەیەك گیرایە)؟

**وەڵام:**

گیرابوونی نزا و پاڕانەوە(استجابة الدعاء) جیایە لە "قبووڵ بوونی"!

چونكه هه‌موو پاڕانه‌وه‌یه‌ك گیرا ده‌بێت، به‌ڵام قبووڵ كردنی پاڕانه‌وه و هاتنه‌دیی داواكارییه‌كه به‌ستراوه به دانایی خواوه‌ند خۆیه‌وه. بۆ ئه‌مه نموونه‌یه‌ك ده‌هێنینه‌وه:

وا دابنێ منداڵێكی نه‌خۆش ده‌برێته لای پزیشكێك، مناڵه‌كه هاوار ده‌كات و ده‌ڵێت:

- "دكتۆر! سه‌یرم بكه بزانه چیمه". پزیشكه‌كه‌ش ده‌ڵێت:

- به‌سه‌رچاو.

مناڵه‌كه ده‌ڵێت:

- "ئه‌و ده‌رمانه‌م بده‌رێ".

لێره‌دا ئه‌و پزیشكه به‌پێی دانایی خۆی و به‌گوێره‌ی به‌رژه‌وه‌ندیی نه‌خۆشه‌كه، هه‌مان ده‌رمان، یان یه‌كێكی له‌وه باشتری ده‌داتێ. یاخود هیچ ده‌رمانێكی بۆ ده‌ستنیشان ناكات.

خواوه‌ندی گه‌وره‌ش - ولله المثل الأعلى- به هه‌مان جۆره. چونكه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی دانای ڕه‌هایه و له هه‌موو ده‌مێكدا ئاماده‌یه و بۆ به‌نده‌كانی ده‌روانێت، ئه‌وا نزای به‌نده‌كانی گیرا ده‌كات. به‌م گیراكردن و ئاماده‌بوونه‌شی نامۆیی و بێزاریی به‌نده‌كه‌ی ناهێڵێت و له بریی ئه‌وه هیوا و دڵنیایی ده‌داتێ و بێزاریی له‌سه‌ر لاده‌بات. ئنجا یان ئه‌وه‌یه خوای گه‌وره یه‌كسه‌ر پاڕانه‌وه‌كه‌ی قبووڵ ده‌كات و داواكارییه‌كه‌ی ده‌هێنێته‌دی، یان له‌وه باشتری پێ ده‌به‌خشێت. یان هیچیان ناكات. هه‌موو ئه‌مانه‌ش به‌پێی داخوازیی "دانایی" په‌روه‌ردگار خۆی، نه‌ك به گوێره‌ی ئاره‌زووی خۆسه‌پێنه‌ر و ئاواتی خراپی ئه‌و به‌نده‌یه!

هه‌روه‌ها پاڕانه‌وه یه‌كێكه له جۆره‌كانی به‌ندایه‌تی بۆ خواوه‌ندی گه‌وره. دیاره به‌روبووم و سووده‌كانی به‌ندایه‌تیش له دواڕۆژدان، نه‌ك دنیا. ئامانج و داواكارییه‌كانی دنیا، "كاتی" ئه‌و پاڕانه‌وانه‌ن، نه‌ك "ئامانج"یان.

بۆ نموونه: "نوێژه‌بارانێ" یه‌كێكه له جۆره‌كانی خواپه‌رستی، باران نه‌بارین "كات"ی ئه‌و په‌رستنه‌یه. كه‌واته ئه‌و به‌ندایه‌تی و پاڕانه‌وه‌یه بۆ بارانبارین نییه. خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌م په‌رستنه ته‌نها به‌و نیازه ئه‌نجام بدرێت، شایانی قبووڵ بوون نابێت، چونكه به پاكی و بێ گه‌ردی و نیازی ڕه‌زامه‌ندیی خوای گه‌وره نه‌كراوه.. هه‌روه‌ها خۆرئاوابوون ڕاگه‌یاندنه بۆ "كاتی" نوێژی شێوان و، ڕۆژ و مانگ گیرانیش "كات"ی نوێژی ڕۆژ و مانگ گیرانن. واته خوای گه‌وره له‌و كاتانه‌دا داوا له به‌نده‌كانی ده‌كات به بۆنه‌ی گیرانی نیشانه‌ی ڕۆژ (خۆر) و نیشانه‌ی شه‌و (مانگ) كه دوو نیشانه‌ن ئاماژه بۆ مه‌زنیی خوای گه‌وره ده‌كه‌ن، جۆره به‌ندایه‌تییه‌كی تایبه‌تی ئه‌نجام بده‌ن. ده‌نا ئه‌م په‌رستنه بۆ ده‌ركه‌وتنی مانگ و خۆر نییه، كه لای ئه‌ستێره‌ناس شتێكی زانراوه.

هەروەك ئەمە لەم نوێژانەدا وایە، بە هەمان جۆر، بێبارانیش "کات"ی نوێژەبارانێیە و، زۆربوونی بەلا و موسیبەت و پەرەسەندن و دەستەلات پەیداکردنی خراپکاری و شتە زیان بەخشەکان، "کات"ی چەند پاڕانەوەیەکی تایبەتین. چونکە لەو کاتانەدا مرۆڤ هەست بە دەستەوسانی و هەژاریی خۆی دەکات و، بە نزا و پاڕانەوە هانا دەباتە بەر دەرگانەی خواوەندی گەورە و خاوەنی توانستی ڕەها.. جا ئەگەر لەگەڵ ئەم پاڕانەوە توندوتیژەدا خواوەند ئەو بەلا و موسیبەت و خراپکارییانەی دوور نەخستەوە، ئەوا ناوترێت: پاڕانەوەکە گیرا نەبووە. بەڵکو دەوترێت: کاتی پاڕانەوەکە تەواو نەبووە و هێشتا بەردەوامە. خۆ ئەگەر خوای گەورە بە چاکە و بەخشایشی خۆی ئەو بەلا و موسیبەتەی لەسەر هەڵگرت، ئەوا کاتی پاڕانەوەکە تەواو بووە. کەواتە بەوەدا دەرکەوت: "پاڕانەوە" یەکێکە لە نهێنییەکانی خواپەرستی و بەندایەتی.

بەندایەتیش دەبێ پاك و بێ گەرد بێت و تەنها بە نیازی ڕەزامەندیی خوای گەورە ئەنجام بدرێت، بەوەی کە مرۆڤ لە ڕێی پاڕانەوەکەیەوە هانا بەرێت بۆ لای پەروەردگار و، دەستەوسانی و کۆڵەواریی خۆی بۆ دەربېرێت و دەست نەخاتە ناو کاروباری پەروەردگارێتیی خوای گەورەوە، یان ڕەخنەی لێ نەگرێت. بەڵکو هەموو کارێکی تەسلیمی ئەو بکات و پشتی پێ ببەستێت و، لە دانایی ئەو دڵنیا بێت و، میهرەبانیی خواوەند تاوانبار نەکات و لێی نائومێد نەبێت.

بەڵێ، بە ئایەتە ڕوونەکانی قورئان چەسپاوە کە بوونەوەران هەریەکەیان لە ڕێی تەسبیحات و بەندایەتی و سوژدەی تایبەتیی خۆیانەوە، لە باری تەسبیحات کردندان بۆ خوای گەورە. بەم بارودۆخە لەژمارەبەدەرەی بەندایەتیی بوونەوەران، ڕێگاکانی نزا و پاڕانەوە دەردەکەون، کە چەند ڕێگایەکن مرۆڤ دەگەیەننە سایەی پەروەردگارێکی مەزن.

جا ئەم پاڕانەوانەش یان لە ڕێی زمانی توانا و لێهاتنەوەن، وەك پاڕانەوەی تێکڕای ڕووەك و زیندەوەران کە هەریەکەیان لە خواوەندی بەخشندە داوای شێوە و وێنەیەکی تایبەتی دەکات کە بەشێکی لە ناوە جوانەکانی خواوەندی تێدایە.. یان لە ڕێی زمانی پێداویستیی سروشتیی ئەو شتەوەن، وەك پاڕانەوەکانی هەموو جۆرەکانی زیندەوەران لە بارەی ئەو پێداویستییانەیان کە دەستیان پێیان ناگات، ئیتر هەر زیندەوەرێك بە زمانی پێویستیی فیتریی خۆی یان لە ڕێی هۆکارەکانی بەردەوامیی "بوون"ی - کە وەك ڕۆزیی ئەو وایە - پێویستییەکانی لە خواوەندی بەخشندە داوا دەکات.. یان لە ڕێی زمانی "ناچاری"یەوە، وەك پاڕانەوەی ئەو کەسەی کە لە تەنگانەدایە و بەوپەڕی لالانەوەی بەکوڵ

له خوای گه‌وره‌ی پارێزه‌ر و په‌نهان و یارمه‌تیده‌ر ده‌پاڕێته‌وه. بگره پێویستی‌یه‌كانی ته‌نها ئه‌و په‌روه‌ردگاره میهره‌بانه داوا ده‌كات كه پێداویستیی ئه‌م ناهێڵێت و په‌نای ده‌دات.

ئه‌م سێ جۆره پاڕانه‌وه‌یه، مه‌گه‌ر شتێكیان بێته‌ڕێ كه ببێت به‌هۆی قبوول نه‌بوون. ده‌نا هه‌ر قبوول ده‌بن.

جۆری چواره‌می پاڕانه‌وه، پاڕانه‌وه‌كانی ئێمه‌ن. ئه‌مانه‌ش دوو جۆرن:

یه‌كێكیان به كردار و حاڵ ده‌بێت و، ئه‌وی تریان به دڵ و زمان.

بۆ نموونه: به‌كارهێنانی هۆكاره‌كان دوعایه به كردار. هه‌رچه‌نده‌ش هۆكاره‌كان ئه‌و شته دروست ناكه‌ن كه خۆیان هۆی دروست‌بوونی ئه‌ون، به‌ڵكو ئه‌م به‌كارهێنانه‌ی هۆكاره‌كه بۆ ئه‌وه‌یه كه مرۆڤ له بارێكی وادا بێت شیاوی ڕه‌زامه‌ندیی خوا بێت كاتێ كه به زمانی حاڵ لێی ده‌پاڕێته‌وه. به ڕاده‌یه‌ك كه "زه‌وی كێڵاندن" به لێدانی ده‌رگای گه‌نجینه‌ی میهره‌بانیی خواوه‌ند داده‌نرێت! جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م چه‌شنه پاڕانه‌وه‌یه‌ی كه به كردار ده‌رده‌بڕرێت ڕاسته‌وخۆ ڕووی له ناونیشانی ناوی "الجواد"ی خوای گه‌وره‌یه، ئه‌وا زۆربه‌ی جار ده‌ستی به ڕووه‌وه نانرێت و قبوول ده‌كرێت.

به‌شی دووهه‌میش كه به دڵ و زمانه، واته كه بریتی‌یه له داواكردنی هاتنه‌دیی ئه‌و داواكاری‌یانه‌ی كه به مرۆڤ نایه‌نه‌دی و ده‌ستی پێیان ناگات، ئه‌وا گرنگترین لایه‌ن و ڕووی ئه‌م جۆره پاڕانه‌وه‌یه و نه‌رمونیانترین ئامانج و به‌تامترین به‌روبوومی له‌وه‌دایه كه ئه‌و كه‌سه‌ی ده‌پاڕێته‌وه، هه‌ست ده‌كات یه‌كێك هه‌یه گوێی له ختووره‌ی دڵی بێت و، ده‌ستی به هه‌موو شتێك بگات. ده‌زانێت ئه‌و كه‌سه‌ی كه لێی ده‌پاڕێته‌وه ده‌توانێت هه‌موو هیوا و ئاواته‌كانی بۆ بهێنێته دی و، به‌زه‌یی به ده‌سته‌وسانی و كۆڵه‌واری‌یه‌كه‌ی ئه‌مدا بێته‌وه و، دڵی هه‌ژاری‌یه‌كه‌شی بداته‌وه.

ده‌سا ئه‌ی مرۆڤی بێ‌ده‌سه‌ڵاتی هه‌ژار!

نه‌كه‌یت ده‌ست له كلیلی گه‌نجینه‌ی ئه‌و میهره‌بانی‌یه فراوانه و، سه‌رچاوه‌ی ئه‌و هێزه توند و پته‌وه هه‌ڵبگریت كه "پاڕانه‌وه"یه له خوای گه‌وره! نه‌خێر، به توندی ده‌ستی پێوه بگره، با به‌ره‌و بڵندترین پله‌ی مرۆڤایه‌تی به‌رز ببیته‌وه و پاڕانه‌وه‌ی هه‌موو بوونه‌وه‌رانیش بكه به به‌شێك له پاڕانه‌وه‌كه‌ت و، خۆیشت بكه به به‌نده‌یه‌كی هه‌مه‌كی و وه‌كیلێكی گشتیی بوونه‌وه‌ران كاتێ كه ده‌ڵێیت: ﴿**إيّاك نستعين**﴾ و، جوانترین بوونه‌وه‌ری نرخێنراوی ئه‌م گه‌ردوونه به.

* * *

# باسی دووهەم

**(ئەم باسە بریتی‌یە لە پێنج سەرنج لە بارەی بەختەوەری و بەدبەختیی مرۆڤەوە).**

**لەبەر ئـەوەی "مرۆڤ" لە جوانترین شـــێوەدا بـەدی‌هێنراوە و، تـەواوترین تواناو لێهاتوویی پێ بەخشراوە، ئەوا لـەم گۆڕەپـانی تاقیکردنەوەیـەی دنیـای‌دا، دەتوانێت بڕواتە ناو چەندین پلە و پایەی بەرز و نزمی یەك لـە دوای یەکەوە و، هەر لـە بەندیخانەی: "أسفل سافلین"ەوە تا باخچەکانی: "أعلی علیـــین" و، هـەر لـە گەردیلـەوە تا دەگاتـە گەلـەستێرەکان و، هـەر لـە زەوی‌یـەوە تـا عـەرش، دەتوانێت بە پلەکاندا سـەربکەوێت یـان دابـەزێت. چونکـە بـواری پلـەکانی سەرکەوتن و دابەزینی ئەو دوو ڕێگایەی لە بەردەمدا والاّ کراوە. بـەم جـۆرە، مـرۆڤ لـە شـــێوەی موعجـــیزەی توانســـتێك و، ئـــەنجامی بەدیـــهێنانێك و، سەرسووڕهێنەریی سنعەتێکدا، نێرراوەتە سەر زەوی.**

**وا لێرەدا، لە نێوان "پێنـــج سـەرنجی ورد"دا نهێنی‌یـەکانی ئـەم سـەرکەوتنە جوانانە و، ئەم دابەزین و کەوتنەخوارەوە سامناکانە ڕوون دەکەینەوە:**

**○ سەرنجی یەکەم:**

مرۆڤ پێویستیی بە زۆربەی جۆرەکانی بوونەوەرانە و، پەیوەندی‌یەکی بەتینی لەگـەڵیاندا هـەیە. دەبینیـت پێداویسـتی‌یەکانی بـە هـەمـوو لایـەکی جیهـاندا بـلاّو بوونەتـەوە و، هیـوا و ئـاوات و ئارەزووەکانیشی تا ئەبەد درێژ و بەردەوامن. هەروەك داوای تاقە گوڵێـك دەکـات، داوای بەهارێکی ڕەنگینی فراوانیش دەکات.. هـەروەك حـەزی لـە سـەوزایی و باخچەیـەکی جـوان و دڵڕفێنـە، ئارەزوومـەندی بەهەشـتی هەمیشەیی‌یشـە.. هـەروەك لـە تاسـەی بینینـی خۆشەویستێکی‌دایە، لـە تاسەشدایە بۆ بینینـی خـواوەنـدی جـوان و شـکۆمەند و مـەزن لـە بەهەشتدا.. هـەروەك پێویستی بـە کردنـەوەی دەرگـای ژوورێکـە بـۆ بینینـی هاوڕێیـەکی خۆشەویستی کە لەو ژوورەدا بێـت، هەر بەو جۆرەش پێویستی بە سەردانی جیـهانی بەرزەخە کە لە سەدا نەوەدونۆی هاوەڵ و خۆشەویستانی تێدایە.. هەروەها پێویستیشی بە هانابردنـە بـۆ دەرگانـەی خـواوەنـدی بـەتوانا، ئـەو خـوایـەی کـە دەرگـای فراوانـی گـەردوون دادەخـات و

ده‌رگای دوارۆژی پڕ له‌ شتی سه‌رسوورهێنه‌ر ده‌كاته‌وه‌و، دنیا لاده‌بات تاكو دوارۆژ له‌ جێگای‌دا دابنێت، بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌م مرۆڤه‌ هه‌ژاره‌ له‌ ئازاری جودایی هه‌میشه‌یی ڕزگار بكات.

جا مادەم ئه‌مه‌ حاڵی مرۆڤه‌، ئه‌وا په‌رستراوی ڕاسته‌قینه‌ی ئه‌و، ته‌نها ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ هه‌موو كارێكی به‌ده‌سته‌ و گه‌نجینه‌ی هه‌موو شتێكی له‌ لایه‌و، چاوی له‌ هه‌موو شتێكه‌و، بێ جێگایه‌ و ئاماده‌ی هه‌موو شوێنێكه‌و، له‌ ناته‌واوی و كۆڵه‌واری و بێ ده‌ستی دووره‌و، خاوه‌ن توانا و، شكۆمه‌نده‌و، میهره‌بان و جوانه‌و، كامڵ و دانایه‌. چونكه‌ كه‌س ناتوانێت پێداویستی‌یه‌كانی مروڤێكی خاوه‌ن ئاواتی له‌ڕاده‌به‌ده‌ر بهێنێته‌دی و دابین و ده‌سته‌به‌ریان بكات بۆی، مه‌گه‌ر كه‌سێك كه‌ خاوه‌نی زانینێكی گشتیی بێ سنوور و توانایه‌كی له‌بن نه‌هاتوو بێت. كه‌واته‌ جگه‌ له‌و كه‌سی تر شایانی په‌رستن نی‌یه‌.

ده‌سا ئه‌ی مرۆڤ! ئه‌گه‌ر باوه‌ڕ به‌ خوای تاك و ته‌نیا بهێنیت و، ته‌نها به‌نده‌ی ئه‌و بیت، ئه‌وا پله‌یه‌كی به‌رزت له‌ سه‌رووی پله‌ی هه‌موو بوونه‌وه‌رانه‌وه‌ ده‌ستگیر ده‌بێت. ده‌نا ئه‌گه‌ر پشت له‌ به‌ندایه‌تیی ئه‌و هه‌ڵبكه‌یت و خۆتی لێ گێل بكه‌یت، ئه‌وا ده‌بیت به‌ به‌نده‌یه‌كی سه‌رشۆڕی ڕسوا له‌ به‌رده‌م بوونه‌وه‌ره‌ لاواز و كۆڵه‌واره‌كاندا! خۆ ئه‌گه‌ر به‌ خۆویستی و توانای خۆته‌وه‌ بنازیت و، واز له‌ پاڕانه‌وه‌ و پشت به‌ خوابه‌ستن بهێنیت و، خۆت به‌ گه‌وره‌ بگریت و، له‌ ڕاسته‌ شه‌قامی حه‌ق و ڕاستی لابده‌یت، ئه‌وا له‌ ڕووی چاكه‌كاری و ئه‌نجامدانی كاری باشه‌وه‌ له‌ مێرووله‌ و هه‌نگ لاوازتر ده‌بیت و، له‌ ڕووی كاولكاری و خراپكاریشه‌وه‌ له‌ چیا قورستر و له‌ تاعوون زیانبه‌خش‌تر ده‌بیت.

به‌ڵێ، تۆی مرۆڤ دوو لایه‌نت هه‌یه‌:

*یه‌كه‌میان*: لایه‌نی به‌دیهێنان و، بوون و، چاكه‌ و، ئیجابی‌یه‌ت و، كاركردن.

*ئه‌وی تریان*: لایه‌نی كاولكاری و، نه‌بوون و، شه‌ڕ و، سه‌لبی‌یه‌ت و كارتێكراوی(انفعال).

سه‌باره‌ت به‌ لایه‌نی یه‌كه‌مه‌وه‌، كه‌ لایه‌نی به‌دیهێنانه‌، تۆی مرۆڤ له‌ چۆله‌كه‌ و هه‌نگ بێ ده‌سته‌ڵات‌تر و له‌ مێش و جاڵجاڵۆكه‌ش لاوازتریت.

به‌ڵام سه‌باره‌ت به‌ ڕووی دووهه‌مه‌وه‌، كه‌ لایه‌نی كاولكاری‌یه‌، ئه‌وا ده‌توانیت زه‌وی و چیا و ئاسمانه‌كان تێپه‌ڕ بكه‌یت و، ئه‌وه‌ی ئه‌وان له‌ ده‌ستی هه‌ڵهاتن، تۆ بیخه‌یته‌ ئه‌ستۆی خۆته‌وه‌و، به‌مه‌ش ده‌رفه‌ت و بازنه‌یه‌كی فراوانتر به‌ده‌ست ده‌هێنیت، چونكه‌ كاتێ كه‌ خێر و چاكه‌ ئه‌نجام ده‌ده‌یت، ئه‌وا به‌پێی فراوانیی وزه‌ و توانای خۆت و ئه‌ندازه‌ی هه‌وڵ و ته‌قالا و هێزت كار ده‌كه‌یت. به‌ڵام ئه‌گه‌ر خراپه‌ و كاولكاری ئه‌نجام بده‌یت، ئه‌وا ئه‌م خراپكاری‌یه‌ت له‌ خۆی‌دا ده‌ته‌نێته‌وه‌ و په‌ره‌ ده‌سێنێت و فراوان ده‌بێت.

بۆ نموونە: "کوفر" خراپە و کاولکاری و بەدرۆخستنەوەیە. بەڵام ئەم تاکە خراپەیە، سەری لە: بێنرخ کردن و سووك سەیر کردنی گشت بوونەوەرانەوە دەردەچێت و، پووچەڵ کردن و ئینکاری کردنی هەموو ناوە جوانەکانی خوای گەورەی تێدایە، هەروەك ئەنجامیشی سووك سەیرکردن و نرخ دانەنان دەبێت بۆ مرۆڤایەتی. چونکە لەبەر ئەوەی بوونەوەران چەند نووسراوێکی پەروەردگار و چەند ئاوێنەیەکی خواوەند و چەند فەرمانبەر و کار پێ سپێرراوێکن لە لایەن خوای گەورەوە، ئەوا هەریەك لەم بوونەوەرانە پلەیەکی بەرز و فەرمانبەرییەکی پڕ واتایان هەیە.

جا "کوفر" سەرەڕای ئەوەی کە ئەم بوونەوەرانە لە پلە و پایەی کار پێسپێرراوی و فەرمانبەری و بەندایەتی دادەگرێتە خوارەوە، لەگەڵ ئەوەشدا فڕێیان دەداتە پلەی نزمی گاڵتەجاڕی و ڕێکەوتەوە و، ئنجا بەهۆی ئەو لەناوچوون و نەمانەی کە دێتە ڕێیان و، بەهۆی کاولکاری و زیاندان هیچ نرخێکیان تێدا نامێنێت. ئەم نەمان و لەناوچوونەش بوونەوەران تێکدەدەن و هەڵیان دەوەشێننەوە و دەیانکەن بە چەند ماددەیەکی بێنرخ و فانی و نەزۆك و بێ سوود و بێ بایەخ و لەناوچوو..

لە هەمان کاتدا "کوفر" ئینکاریی ناوە جوانەکانی خوای گەورە دەکات و خۆی گێل دەکات لێیان، ئەو ناوانەی کە لەسەر ڕووی ئاوێنەکانی گشت بوونەوەراندا جوانی و نەخش و نیگاریان دەردەکەون و دەدرەوشێنەوە، بە ڕادەیەکی وا ئەوەی کە پێی دەوترێت: "مرۆڤایەتی" و قەسیدەیەکی هۆنراوی پڕ لە دانایییە، بە وردی و جوانی هەموو درەوشانەوەکانی ناوە جوان و پاك و پیرۆزەکانی خواوەند ئاشکرا دەکات و، موعجیزەی توانستێکی سەرسووڕهێنەرە کە وەك تۆوی درەختێکی هەمیشەیی وایە. ئەم "مرۆڤایەتی"یە، لەو شێوە زیندووەی کە بە هۆیەوە بەسەر چیا و زەوی و ئاسمانەکاندا سەرکەوت و، بەم بۆنەیەوە ئەمانەتی هەرەمەزنی خستە ئەستۆی خۆیەوە و، فەزڵی بەسەر مەلائیکەتاندا دراو گەیشتە ئەوەی خاوەنی پلەی جێنشینی بێت.. مرۆڤایەتی لەم شێوە زیندووە و لەم پلە و پایە بەرزەیەوە، "کوفر" دایدەگرێتە خوارەوە و فڕێی دەداتە چەند پلەیەکی هێندە نزمەوە کە لە هی سووکترین و نزمترین پلەی هەر بوونەوەرێکی کۆڵەوار و لاواز و هەژار و فانی، نزمتر بێت. بەڵکو فڕێی دەداتە پلەی نزمی بێنرخترین شێوەی ناشیرینەوە کە بە زوویی دەڕوات و لەناو دەچێت.

**پوخته‌ی ئه‌م قسانه ئه‌وه‌یه كه:**

ده‌روونی به‌دخوازی مرۆڤ (النفس الامـــارة بالســـوء) لـه لایـه‌نی "خراپـه" و "شـه‌ڕ" و كاولكاری‌یه‌وه، ده‌توانێت تاوانی له‌ڕاده‌به‌ده‌ر و بێ سنوور بكات. بـه‌ڵام لـه لایـه‌نی "خێر" و ئه‌نجامدانی كاری "چاكه"وه، توانا و وزه‌ی ئه‌و جوزئی و كه‌مه. چونكه مرۆڤ ده‌توانێـت بـه یه‌ك ڕۆژ خانوویه‌ك برووخێنێت، كه‌چی ناتوانێت له سه‌د ڕۆژدا دروستی بكات!

به‌ڵام ئه‌گه‌ر مرۆڤ واز له خۆویستی بهێنێت و، داوای خێر و چاكه و بوون لـه خـوای گه‌وره بكات و پشت به یارمه‌تیدانی ئه‌و ببه‌ستێ و هه‌موو كارێك بگێڕێته‌وه بۆ ئـه‌و خوایـه و، له خراپه و كاولكاری دوور بكه‌وێته‌وه و، شـوێنی ئاره‌زووه‌كـانی ده‌روونـی نه‌كـه‌وێت و، بـه ته‌واوی ببێت بـه به‌نده‌یـه‌كی ڕاسـت و تۆبـه‌كاری خـواوه‌نـد و، هـه‌رده‌م لـه داوای لێبـوردن و زیكـری خـوادا بێـت، ئـه‌وا ئـه‌و كاتـه واتـای ئـه‌م ئایه‌تـه پـیرۆزه‌ی تێـدا ده‌رده‌كـه‌وێت، كـه ده‌فه‌رموێ: ﴿**يُبَدِّلُ اللهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ**﴾ (الفرقان: ٧٠).

ئـه‌و كاتـه‌ش ئـه‌و توانـا و لێهاتنـه مه‌زنـه‌ی كـه بـۆ خراپكـاری هه‌یـه‌تی، بـۆ چاكـه‌كاری هه‌ڵده‌گه‌ڕێته‌وه و، نرخی: ﴿**أحسن تقـــويم**﴾ به‌ده‌سـت ده‌هێنێـت و، بـه‌ره‌و "أعلـى عليـين" ده‌فڕێت و به‌رز ده‌بێته‌وه.

ئـه‌ی مرۆڤـی بێ‌ئاگـا! سـه‌یری چاكـه و به‌خشایشـی خـوای گـه‌وره بكـه: لـه كـاتێكدا "دادگه‌ری" داخوازی ئه‌وه‌یه كه یه‌ك خراپه به سه‌د بنووسرێت و، یه‌ك چاكـه‌یش بـه یـه‌كێك، یان هه‌ر نه‌نووسرێت، چونكـه خێر و به‌رژه‌وه‌ندی‌یه‌كـه‌ی بـۆ مـرۆڤ خـۆی ده‌گه‌ڕێتـه‌وه. لـه كـاتێكدا "دادگـه‌ری" داخـوازی ئه‌مه‌یه، كـه‌چی خـواوه‌نـدی گـه‌وره‌ی بـه‌توانا "خراپـه" بـه یه‌كێك و، "چاكه"ش به: ده چه‌ندانه، تا ده‌گاته حه‌فتا، یان حـه‌وت سـه‌د، یـان حـه‌وت هـه‌زار چه‌ندانه‌ی ئه‌و "یـه‌ك" دانـه چاكه‌یـه، ده‌نووسێت! كه‌واتـه لـه‌م سـه‌رنجه‌وه تێ‌بگـه لـه‌وه‌ی كـه چوونه ناو دۆزه‌خ له سـزای كـرده‌وه‌ی خراپـدا، یه‌كپارچـه دادگه‌ری‌یـه و، چوونـیش بـۆ نـاو به‌هه‌شت ته‌نها چاكه و میهره‌بانی و به‌خشایشێكی خواوه‌ندی میهره‌بانه.

**○ سه‌رنجی دووهه‌م:**

دوو لایه‌ن له مرۆڤدا هه‌ن:

یه‌كـه‌میان: لایـه‌نی خۆویستی‌یه، كـه ته‌نـها بـه‌نده بـه ژیـانی دنیـاوه. ئـه‌وی تریـان: لایـه‌نی به‌ندایه‌تی‌یه بۆ خوای گه‌وره، كه لایه‌نێكه تا ئه‌به‌د ده‌خایه‌نێت و درێژه ده‌كێشێت.

سه‌باره‌ت بـه لایـه‌نی یه‌كـه‌م، مـرۆڤ به‌دیـهێنراوێكی هـه‌ژاره، چونكـه سـه‌رمایه‌ی ئـه‌و لـه باره‌ی ئه‌و ویسته هه‌نده‌كی‌یه‌ی كه هه‌یه‌تی، شتێكی تابڵێی كه‌مه و وه‌ك تاڵه‌موویـه‌ك وایـه و..

توانایشی تەنها بەدەستهێنان(الكسب)ە لە سنوورێكی لاوازدا و.. ئەوەندەش بەشی لە ژیاندا هەیە كە ژیانەكەی وەك بلێسەیەك وایە و، بە زوویی و خێرایی دەكوژێتەوە و.. لە تەمەنیشدا خاوەنی ماوەیەكی كەم خایەن و كتوپڕە و.. لە "بوون"یشدا دارای تەنها جەستە و لەشێكی ئەوتۆیە كە بە خێرایی دادەڕزێت. لەگەڵ ئەمانەشدا، ئەم مرۆڤە، دانە و تاكێكی نەرم و ناسكی لاوازە لەناو چەندین تاك و جۆری لەژمارەبەدەری ڕیزبەستووی ناو چینەكانی بوونەوەراندا.

بەڵام سەبارەت بە لایەنی دووهەمی مرۆڤەوە، بە تایبەت لە ڕووی دەستەوسانی و لاوازی‌یەكەیەوە كە دەڕوانێتە "بەندایەتی"یەكەی بۆ خوای گەورە، دەرفەتێكی فراوان و گرنگی‌یەكی گەورەی هەیە. چونكە بەدیهێنەری دانا لە چییەتیی مرۆڤدا دەستەوسانی‌یەكی گەورەی بێ كۆتایی و، هەژاری‌یەكی زۆری بێ سنووری داناوە، تاكو ئەم مرۆڤە ببێت بە ئاوێنەیەكی گشتی و تابلێی فراوان بۆ دەركەوتن و درەوشانەوە لەڕادە بەدەرەكانی خواوەندی "بە توانای میهرەبان" كە توانا و میهرەبانی‌یەكەی كۆتایی نی‌یە و، خواوەندی "دەوڵەمەندی بەخشندە" كە دەوڵەمەندی و بەخشندەیی‌یەكەی هەرگیز تەواو نابێت.

بەڵێ، مرۆڤ وەك "تۆو" وایە. ئەوەتا لە لایەن "قودرەت"ی خوای گەورەوە چەندین ئامێری مەعنەوی بە "تۆو" بەخشراون و، لە لایەن "قەدەر"یشەوە نەخشەیەكی ورد و گرنگی تێدا دانراوە، تاكو بتوانێت لەناو خاكدا كاری خۆی ڕاپەڕێنێت و پاشان گەشە بكات و، لەو جیهانە تەسك و تاریكەوە بۆ جیهانی هەوا و دنیای فراوان و سەربەست بڕوات و، لە پاشاندا بە زمانی "توانا و لێهاتوویی‌یەكانی" هانا بەرێتە لای بەدیهێنەری خۆی و لێی بپاڕێتەوە، تاكو ببێت بە درەخت و بگاتە ئەو كەماڵەی كە شیاوێەتی. جا ئەگەر ئەم "تۆوە" بەهۆی میزاج و چێژی خراپی خۆی بڕوات ماددەیەكی زیانبەخش بهێنێت و، ئامێرە مەعنەوی‌یەكانی، كە پێی بەخشراون، لە پێناوی ئەو ماددانەدا بخاتە كار، دیارە بێ هیچ گومانێك ئەنجامی ئەم كارەی زۆر ناهەموار دەبێت، چونكە ئەوەندە ناخایەنێت كە بە بێ سوود و دەستكەوتێك بۆگەن دەكات و لە جێی خۆی‌دا دەڕزێت.

بەڵام ئەگەر ئامێرە مەعنەوی‌یەكانی بۆ فەرمانی تەكوینیی خواوەندی: ﴿**فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى**﴾ (الأنعام:٩٥) ملكەچ بكات و بە باشی بەكاریان بهێنێت، ئەوا لەو جیهانە تەسكەی دەردەچێت و دەبێت بە درەختێكی تەواوی بەرداری ڕێكوپێك و، حەقیقەتە بچووك و هەندەكی و گیانە مەعنەوی‌یەكەی، شێوە ڕاستی‌یە هەمەكی و گەورەكەی وەردەگرێت.

بەڵێ، هەروەك "تۆو" وایە، "مرۆڤ"یش وایە. ئەوەتا لە لایەن توانست(قودرەت)ی خواوەندەوە چەندین ئامێری مەعنەویی گرنگ لە ماهییەتی‌دا دانراون و، لە لایەن "قەدەر"ی

خوایشه‌وه چه‌ندین به‌رنامه‌ی ورد و گرانبه‌های پێ به‌خشراوه. جا ئه‌گه‌ر ئه‌م مرۆڤه له ویست و ته‌قدیری خۆیدا به هه‌ڵه‌دا بچێت و، ئامێره مه‌عنه‌وی‌یه‌كانی له ژێر خاكی ژیانی دنیا و جیهانی ته‌سك و سنوورداری زه‌ویدا، بۆ ئاره‌زووی ده‌روونی خۆی به‌كار بهێنێت، ئه‌وا وه‌ك تۆوه‌كه بۆگه‌ن ده‌كات و داده‌رزێت. دیاره ئه‌م كاره‌شی له‌به‌ر له‌زه‌تێكی كه‌می نێوان ژیانێكی كورتدایه، كه له جێگایه‌كی بچووك و بارێكی ناهه‌مواری پڕ له ئازاردا ده‌یباته سه‌ر، پاشانیش "گیان"ی هه‌ژاری ئه‌م مرۆڤه، ئه‌ركی ئه‌م لێپرسراوی‌یه‌ی ده‌كه‌وێته ئه‌ستۆ و، به زه‌ره‌رمه‌ندی و نائومێدی‌یه‌وه دنیا به‌جێ ده‌هێڵێت.

به‌ڵام ئه‌گه‌ر مرۆڤ، له ژێر خاكی به‌ندایه‌تی‌دا، سه‌رپه‌رشتیی "توانا و لێهاتنی" خۆی بكات و، به ئاوی ئیسلام ئاودێریی بكات و، ڕووناكیی ئیمانی بداتێ و، ئامێره مه‌عنه‌ویه‌كانی به گوێڕایه‌ڵیی فه‌رمانه‌كانی قورئان به‌ره‌و ئامانجه ڕاسته‌قینه‌كانیان ئاراسته بكات.. ئه‌وا بێ گومان ئه‌و تۆوه چه‌ندین گه‌ڵا و چرۆ و لق و په‌لی لێ ده‌بێته‌وه، كه له جیهانی "میسال" و به‌رزه‌خدا په‌ل ده‌هاوێژن و گوڵه‌كانیان ده‌م ده‌كه‌نه‌وه و، له‌ودنیا و له به‌هه‌شتیشدا نیعمه‌ت و كه‌مالآتی بێ سنوور به‌رهه‌م ده‌هێنن، ئیتر "مرۆڤ" به‌مه ده‌بێت به تۆوێكی به‌نرخی پڕ له ئامێری ئه‌وتۆ كه حه‌قیقه‌تێكی هه‌میشه‌یی و دره‌ختێكی به‌رده‌وامی تێدا كۆ كراوه‌ته‌وه و، ده‌بێت به ئامێرێكی به‌نرخی جوان و، به‌روبوومێكی پیرۆز و ڕووناكی دره‌ختی گه‌ردوون.

به‌ڵێ، به‌رزبوونه‌وه‌ی ڕاسته‌قینه‌ی مرۆڤ له‌وه‌دایه كه: دڵ و، نهێنی و، گیان و، ژیری و، ته‌نانه‌ت ئه‌ندێشه و، گشت ئه‌و هێزانه‌ی كه پێی به‌خشراون، هه‌موویان ڕووه‌و ژیانی هه‌میشه‌یی ئاراسته بكات و، هه‌ریه‌كه‌یان له كاری تایبه‌تیی خۆیدا و، له‌و به‌ندایه‌تی‌یه‌ی كه له‌گه‌ڵی‌دا ده‌گونجێت، بخاته كار.

به‌ڵام ئه‌وه‌ی كه گومڕایان، به گومانی خۆیان، به به‌رزبوونه‌وه و سه‌ركه‌وتنی ده‌زانن و، لایان وایه پێشكه‌وتنی مرۆڤ به‌وه ده‌بێت كه خۆی له شتی پڕوپووچی ژیانی دنیادا نوقم بكات و، له تاموچێژه نزمه‌كانی‌دا ڕۆبچێت و، سه‌ر بكاته تام و له‌زه‌ته هه‌نده‌كی‌یه له‌ناوچووه‌كانی و، ئاوڕ به لای جوانیی بوونه‌وه‌ران و چێژه هه‌میشه‌یی‌یه‌كانی‌دا نه‌داته‌وه و، دڵ و ژیری و لایه‌نه ناسكه مرۆڤانه‌كانی تری بخاته ژێر فه‌رمانی ده‌روونی به‌دخوازی و بیانكات به خزمه‌تكاری ئه‌و ده‌روونه.. ئه‌مه‌ی كه ئه‌وان به پێشكه‌وتن و سه‌ركه‌وتنی ده‌زانن، هه‌رگیزاو هه‌رگیز سه‌ركه‌وتن نی‌یه، به‌ڵكو كه‌وتنه‌خواره‌وه و به‌ربوونه‌وه و دواكه‌وتنه!

له ڕووداوێكی ئه‌ندێشه‌یی‌دا، ئه‌م ڕاستی‌یه‌م دی. وا به‌م نموونه‌یه ڕوونی ده‌كه‌مه‌وه:

ڕۆشتمه ناو شارێكی مه‌زنه‌وه. له‌و شاره‌دا چه‌ندین كۆشك و ته‌لار و خانووی گه‌وره گه‌وره‌م دی. له به‌رده‌م ئه‌و كۆشك و خانووانه‌شدا ئاهه‌نگ و فیستیڤاڵ و شادی، به

شێوەیەك كە سەرنجی مرۆڤیان ڕادەكێشا، ساز كرابوون و، وەكو شانۆ و مەڵهاكان دارای زرق و برق بوون و، بەمە خەڵكیان بۆ لای خۆیان كێش دەكرد. پاشان بە وردی سەرنجم دا، خاوەنی یەكێك لەو كۆشكانەم لە بەردەم كۆشكەكەی خۆیدا دی كە لەگەڵ سەگەكەیدا خەریكی یاری بوو. ئافرەتانیش لەگەڵ لاوانی بیانیدا سەمایان دەكرد و، كیژۆڵە لاوەكانیش گاڵتەوگەپ و یاریی منداڵانیان ساز دەدا و، دەرگاوانی كۆشكەكەش سەرپەرشتیی ئەم حەشاماتەی دەكرد! ئیتر تێگەیشتم لەوەی كە ئەم كۆشكە چۆڵ بووە و دانیشتووانی هاتوونەتەدەر و ئیشوكاری تێدا ڕاوەستاوە و، ئەو خەڵكەش كە نیشتەجێی ئەو كۆشكەن و بەو چەشنە نوقمی سەرلێشێواوی بوون، بە تەواوی دەستیان لە ڕەوشت داشۆردووە و ویژدانیان مردووە و، لە بەردەم كۆشكەكەیاندا سەرگەرمی یاری و گاڵتە و گەپن.

پاشان نەختێ بەولاترەوە ڕۆشتم، كۆشكێكی ترم هاتەڕێ، سەگێكی نوستووم لەبەر دەرگاكەیدا دی و دەرگاوانی كۆشكەكەش مرۆڤێكی ئازا و لەسەرخۆ بوو. هیچ شتێكی سەرنج ڕاكێشیش لە بەردەم كۆشكەكەدا نەبوو. لەبەر ئەوە سەرم لەم ئارامی و بێدەنگییە سووڕما و ناچار پرسیارم لە بارەیەوە كرد و، ئنجا ڕۆشتمە ناو كۆشكەكە. دەبینم د نیشتووانی ئاوەدانیان كردووەتەوە و، هەریەك لە نهۆمی خۆیدا و بەوپەڕی دڵخۆشی و پ‌كی و بێگەردی چەندین كار و فرمانی گرنگ و پڕ لە وردەكاری ئەنجام دەدەن، بە ڕادەیەك كە خۆشی و كامەرانی بە دڵی مرۆڤ ببەخشێت. چەند پیاوێك لە نهۆمی یەكەمدان كاروباری كۆشكەكە بەڕێوە دەبەن و، لە نهۆمێكی سەرووتردا كچان و منداڵان خەریكی خوێندن و خوێندنەوەن و، لە نهۆمی سێهەمدا ژنان سەرگەرمی دروومان و نەخش و نیگاری جوانن لەسەر جل و بەرگدا و، لە دواهەمین نهۆمیشدا خاوەنی كۆشكەكەی سێیە و لەگەڵ پادشادا بە تەلەفۆن لە بارەی دابین كردنی ژیانێكی سەربەست و پڕ دڵنیایی و ئ‌رامی بۆ دانیشتووانی كۆشك، دەدوێت، كە هەریەكەیان بەپێی پسپۆریی خۆی سەرگەرمی ئەو كار و فەرمانبەری و ئەركەیە پێی سپێرراوە و لەگەڵ پلە و شان و شكۆیدا گونجاوە.

جا لەبەر ئەوەی هیچ كام لەوان منیان نەدەبینی، ئەوا كەس ڕێی لێ نەگرتم و بەناو هەموو لایەكی كۆشكەكەدا بەوپەڕی سەربەستی گەڕام و، پاشان هاتمە دەرەوە و، بەناو شارەكەدا گەڕام. دەبینم شارەكە هەمووی لەم دوو جۆرە خانووبەرە و كۆشكانەن. كە پرسیارم لە بارەی هۆكاری ئەمەوە كرد، پێیان وتم: "كۆشكەكانی جۆری یەكەم، كە لە ناوەوە چۆڵن و دەرەوەشیان هەرا و هوریایە و بە ڕووكەش ڕازاوەن، ئەوانە مەڵبەندی پێشەوایانی كوفر و گومڕایین.. كۆشكەكانی جۆری دووهەمیش نیشتەجێی گەورە ئیمانداراانی ئازا و غیرەتمەندن". پاشان لە گۆشەیەكی شارەكەدا كۆشكێكم دی لێی نووسرابوو "سەعید"!

سه‌رم له‌وه زۆر سووڕما! كه سه‌رنجم دا وه‌ك بڵێی وێنه‌ی خۆمی تێدا ببینـم وا هاتـه بـه‌رچاوم! له سه‌رسووڕماندا هاوارم كرد و، به‌ده‌م ئه‌م هـاواره‌وه هاتمـه‌وه هۆشـی خـۆم و لـه‌و ئه‌ندێشـه‌یه بێدار بوومه‌وه!

ده‌مه‌وێ ئه‌م ڕووداوه ئه‌ندێشه‌یی‌یه، به یارمه‌تیی خوا، لێك بده‌مه‌وه:

ئـه‌و شـاره ژیـانی كۆمه‌ڵایـه‌تی و شارسـتانێتیی مرۆڤـه و، هه‌ریـه‌ك لـه‌و كۆشـكانه‌ش مرۆڤێكه و، دانیشتووانی كـۆشـكـه‌كـه‌ش بریتـین لـه ئه‌ندامـه‌كانی ئـه‌و مرۆڤـه، وه‌ك: چـاو و گوێ و.. لایه‌نه ناسكه‌كانی وه‌ك: دڵ و، نهێنی و، گیان و.. هانده‌ره‌كـانی وه‌ك: ئـاره‌زوو و، هێزه تووڕه‌یی و شه‌هوانی‌یه‌كانی. هه‌ریه‌ك له‌و لایه‌نه ناسكانه‌ش بۆ ئه‌نجامدانی به‌ندایه‌تی‌یه‌كی تایبه‌تی ئاماده كراوه و، هـه‌ریه‌كـه‌یان "چێژ" و "ئازار"ی خۆی هه‌یه.. ده‌روون و ئـاره‌زوو و، هێزه تووڕه‌یی‌یه‌كانیش وه‌ك سـه‌گی پاسـه‌وانن لـه‌و كۆشـكه‌دا. جـا سـه‌ردانه‌واندن و ملكـه‌چ بوونـی ئـه‌و لایه‌نـه ناسـك و به‌رزانـه بـۆ فه‌رمانـه‌كانی ده‌روون و ئـاره‌زوو، لـه ڕاسـتی‌دا، به‌رزبوونه‌وه و سه‌ركه‌وتن نی‌یه. به‌ڵكو، بێ هیـچ گومـانێك كـه‌وتن و دابـه‌زین و دواكه‌وتنـه. ئیتر بۆ خۆت لایه‌نه‌كانی‌تر له ڕووناكیی ئه‌مه‌دا، لێك بده‌ره‌وه.

○ سه‌رنجی سێهه‌م:

مـرۆڤ لـه ڕووی ئیشـو كار و تێكۆشـانی ماددی‌یـه‌وه، زینـده‌وه‌رێكی لاواز و ده‌سته‌وسان و كۆڵه‌واره! بازنه‌ی ده‌سته‌ڵات و خاوه‌نێتیی بۆ شتان له‌م ڕووه‌دا ته‌سك و دیاری كراوه و، ئه‌وه‌نده بڕ ده‌كات كه ده‌ستی پێی بگات، ته‌نانه‌ت به‌شێكی زۆری ئه‌م كۆڵه‌واری و لاوازی و ته‌مبه‌ڵی‌یه‌ی مرۆڤ، ئه‌و ئاژه‌ڵـه ماڵی‌یانه‌شی گرتووه‌تـه‌وه كـه جڵـه‌ویان بـه ده‌ستی مرۆڤ سپێرراوه! بۆ نموونه گه‌ر به‌راوردی مه‌ڕ و مانگای ماڵی له‌گه‌ڵ هـی كێـوی‌دا بكرێـت جیاوازی‌یه‌كی مه‌زن له نێوانیاندا ده‌رده‌كه‌وێت.

به‌ڵام مـرۆڤ لـه ڕووی كـارتێكراوی و وه‌رگـیراوی و پاڕانـه‌وه و لـه خـوا داواكردنه‌وه، ڕێبوارێكی ئازیزه لـه میوانخانـه‌ی دنیـادا و، خواوه‌نـدی سـه‌خاوه‌تمه‌ند كردوویـه‌تی بـه میوانـی خـۆی، به ڕاده‌یـه‌كی وا ڕێـزی لـێ نـاوه كـه گه‌نجینـه‌كانی میـهره‌بانیی فراوانـی خـۆی بـۆ كردوونه‌ته‌وه و، خزمه‌تگوزار و دروستكراوانی خۆیشی له خزمه‌تدا بۆ داناون و، بازنه‌یـه‌كی تابڵێی گه‌وره و فراوانیشی بۆ سوود و گـه‌ڕان و حه‌وانـه‌وه‌ی ئه‌و ئامـاده كـردووه، كـه نیـوه تیره‌كه‌ی به ئه‌ندازه‌ی بینینی چاویه‌تی، به‌ڵكو تا كوێ خه‌یاڵی ده‌ڕوات ئه‌و بازنه‌یه‌ش تا ئـه‌وێ فراوانه.

جا ئەگەر مرۆڤ پشت بە خۆویستی و لەخۆبایی‌بوونی خۆی ببەستێت و، ئەوپەڕی ئاواتی بەرزی ئەو ژیانی دنیابێت و، هەموو ڕەنج و تەقالا و کرد و کۆششێکی لە پێناوی دەستخستنی چەند تام و چێژێکی کەم خایەنی دنیادا بێت، ئەوا لە پاشاندا نوقمی بازنەیەکی تەسك دەبێت و کرد و کۆششەکانیشی بەدەم باوە دەڕۆن و بێ ئەنجام دەردەچن و، لە ڕۆژی دواییشدا هەموو ئەندام و ئامێر ولایەنە ناسکەکانی، کە پێی بەخشراون، هەموویان سکاڵای لەدەست دەکەن.. بەڵام گەر هەست بەوە بکات کە میوانێکی ئازیزە و، لە چوار چێوەی ڕەزامەندییەکانی خانەخوێ‌کەی‌دا، کە خواوەندی سەخاوەتمەند و شکۆمەندە، جووڵایەوە و، سەرمایەی تەمەنیشی لە بازنەی کاری ڕەوادا بەسەر بەرد، ئەوا هەڵسوکەوتەکانی لە بازنەیەکی فراوانی ئەوەندە بەریندا دەبێت کە تا ژیانی هەمیشەیی بەردەوام دەبێت و، بە دڵنیایی و ئاسایش دەژی و، هەناسەی ئاسوودەیی هەڵدەکێشێت و دەحەوێتەوە و، ئیتر دەتوانێت بەرەو باڵاترین پلەی بڵندی(أعلى عليين) بەرز ببێتەوە. ئنجا لە دواڕۆژی قیامەتیشدا هەموو ئەو ئامێر و لایەنە ناسك و ئەندامانەی خوا پێی بەخشیون، شایەتیی باشی بۆ دەدەن.

بەڵێ، ئەو ئەندامانەی لە مرۆڤدا دانراون، بۆ ژیانی بێ بایەخی ئەم دنیایە نین، بەڵکو چەند نیعمەتێکن لە پێناوی ژیانێکی بەردەوامی هەمیشەیی زۆر بەنرخدا پێی بەخشراون. چونکە ئەگەر بەراوردێك لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا بکەین، دەبینین مرۆڤ چەندین ئامێری زۆری هەیە و لەم ڕووەوە سەد جار لە ئاژەڵ دەوڵەمەندترە. بەڵام لە ڕووی چێژ وەرگرتن لە ژیانی دنیا، لە ئاژەڵ گەلێ هەژارترە و تەنانەت سەد پلەش لە خوارییەوەیەتی. چونکە مرۆڤ لە هەر چێژ و لەزەتێکی ژیانی دنیادا، شوێنەواری هەزاران ئازاری سەر لێ شێوێن دەبینێت و، لە لایەکەوە ئازارەکانی ڕابوردوو و پەژارە و خەم و خەفەتی ئێستا و مەترسییەکانی ئاییندە و، لە لایەکی ترەوە ئەو ئازارانەی کە لە نەمانی لەزەت و خۆشییەوە پەیدا دەبن، هەموو ئەمانە چێژی مرۆڤ تێکدەدەن و خۆش گوزەرانییەکەی لێڵ دەکەن. چونکە هەر تام و لەزەتێك کە لە دنیادا دەیچێژێت ئازارێك لە جێگای‌دا بەجێ دەهێڵێت. بەڵام ئاژەڵ وا نییە، چونکە بێ هیچ ئازارێك لەزەت لە ژیان دەبات و، بێ هیچ لێڵییەك تامی هەموو شتێك بە خۆشی دەکات و، نە ئازارەکانی ڕابوردوو نە مەترسییەکانی ئاییندە نایترسێنن. ئیتر بۆ خۆی بە خۆشی و حەوانەوە دەژی و شوکرانەی بەدیهێنەریشی دەکات.

کەواتە ئەم مرۆڤەی کە لە جوانترین شێوە و باشترین نرخ و بەهادا بەدی هێنراوە، ئەگەر بیری خۆی تەنها ئاراستەی ژیانی دنیا بکات، ئەوا دادەبەزێتە خوارەوە و سەد پلە لە

گیانه‌وه‌رێكی وه‌ك چۆله‌كه‌ نزمتر ده‌بێت، با له‌ ڕووی سه‌رمایه‌كه‌یه‌وه‌ سه‌د ئه‌وه‌نده‌ی ئاژه‌ڵ به‌رزتریش بێت. ئه‌م ڕاستی‌یه‌م له‌ جێگایه‌كی تردا به‌ نموونه‌یه‌ك ڕوون كردووه‌ته‌وه‌، وا به‌م بۆنه‌یه‌وه‌ لێره‌شدا ده‌یهێنمه‌وه‌:

پیاوێك (ده‌) لیره‌ی زێرینی به‌ خزمه‌تگوزاره‌كه‌ی خۆی دا و فه‌رمانی داپێ كه‌ ده‌ستێك جل و به‌رگی له‌ باشترین پارچه‌ی نایاب بۆ خۆی پێ بكڕێت. (هه‌زار) لیره‌ی زێڕینیشی به‌ خزمه‌تگوزارێكی تری دا و لیسته‌یه‌كی بچووكیشی له‌گه‌ڵدا داپێ كه‌ پێداویستی‌یه‌كانی تێدا نووسرابوون و، پاره‌ و لیسته‌كه‌ی خسته‌ ناو گیرفانی ئه‌م خزمه‌تگوزاره‌وه‌ و ناردی بۆ بازاڕ. خزمه‌تگوزاری یه‌كه‌م به‌ (ده‌) لیره‌كه‌ ده‌ستێك جل و به‌رگی جوانی له‌ باشترین پارچه‌ی نایاب پێ كڕی. خزمه‌تگوزاری دووهه‌میش چاوی له‌وی تر كرد و وه‌ك ئه‌وی كرد، ئه‌وه‌نده‌ش نه‌فام بوو، سه‌یرێكی لیسته‌كه‌ی نه‌كرد، به‌ڵكو هه‌ر هه‌زار لیره‌كه‌ی كرده‌ ده‌ستی فرۆشیار و داوای ده‌ستێك جل و به‌رگی پیاوانه‌ی لێ كرد، ئه‌م فرۆشیاره‌ بێ ویژدانه‌ش ده‌ستێكی له‌ خراپترین جۆر بۆ هه‌ڵبژارد. كاتێ ئه‌م خزمه‌تگوزاره‌ به‌دبه‌خته‌ بۆ لای گه‌وره‌كه‌ی گه‌ڕایه‌وه‌ و له‌ به‌رده‌می‌دا ڕاوه‌ستا، گه‌وره‌كه‌ی تابلێی قسه‌ی پێ وت و سه‌رزه‌نشتی كرد و به‌ توندیش سزای دا.

دیاره‌ ئه‌و كه‌سه‌ش كه‌ خاوه‌نی نزمترین هه‌ست و وریایی بێت، یه‌كسه‌ر ده‌زانێت خزمه‌تگوزاری دووهه‌م، كه‌ هه‌زار لیره‌كه‌ی درایێ، بۆ ئه‌وه‌ نه‌نێررا تا له‌ بازاڕ ده‌ستێك به‌رگ و پۆشاك بكڕێت، به‌ڵكو بۆ ئه‌وه‌ی بازرگانی‌یه‌كی گرنگ به‌و پاره‌یه‌وه‌ بكات.

مرۆڤیش وه‌هایه‌، كه‌ ئه‌م هه‌موو ئامێره‌ مه‌عنه‌وی و لایه‌نه‌ ناسكه‌ مرۆڤانه‌یه‌ی دراوه‌تێ، كه‌ ئه‌گه‌ر هه‌ریه‌كه‌یان له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی له‌ ئاژه‌ڵدایه‌ به‌راورد بكرێت، ده‌رده‌كه‌وێت سه‌د ئه‌وه‌نده‌ی ئه‌وه‌ی ئاژه‌ڵه‌كان درێژتر و فراوانترن. بۆ نموونه‌: له‌ كوێ "چاو"ی مرۆڤ كه‌ هه‌موو پله‌كانی جوانی ده‌ناسێت و.. هه‌ستی "چه‌شتن"ی كه‌ تامی هه‌ریه‌ك له‌ خوارده‌مه‌نی‌یه‌ جیاجیاكان ده‌زانێت و لێكیان جیا ده‌كاته‌وه‌ و.. "ژیری"یه‌كه‌ی كه‌ ده‌ڕواته‌ ناو كاكڵه‌ی ڕاستی‌یه‌كان و وردترین لایه‌نیانه‌وه‌ و.. "دڵ"یشی كه‌ له‌ شه‌وق و تاسه‌دایه‌ بۆ هه‌موو جۆرێكی به‌رزی و كه‌ماڵێك كه‌ بۆ مرۆڤ بشێت.. له‌ كوێ ئه‌مانه‌ی مرۆڤ و هاوچه‌شنیان له‌گه‌ڵ ئامێره‌ ساده‌كانی ئاژه‌ڵدا به‌راورد ده‌كرێن، كه‌ ئه‌وپه‌ڕی تا دوو پله‌ یان سیان ده‌رده‌كه‌ون و له‌وه‌ زیاتر هه‌ست به‌ شتی تر ناكه‌ن؟ مه‌گه‌ر ئه‌و ئه‌رك و فرمانه‌ تایبه‌تی‌یانه‌ی كه‌ به‌ ئه‌ندامێك یان ئامێرێكی تایبه‌تیی ئاژه‌ڵێكی دیاری‌كراو به‌خشراوه‌، چونكه‌ ئه‌م ئامێره‌ كاری خۆی زۆر له‌ مرۆڤ باشتر ده‌باته‌ سه‌ر له‌و كارانه‌دا كه‌ به‌ مرۆڤ نه‌سپێرراون.

هۆکار و نهێنیی زۆریی ئامێرەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە: لەبەر ئەوەی خاوەنی ژیری و بیرکردنەوەیە، ئەوا هەستەکانی ئەو هێز و گەشەکردن و دەرکەوتن و فراوانیی زۆرتریان بەدەست هێناوە. دەبینیت لەبەر ئەوەی پێداویستییەکانی زۆر و جۆراوجۆرن، ئەوا مەودای جەمسەربوونی هەستەکانی جیاوازن و، بەو بۆنەیەوە هەستەکانی زۆر جۆراوجۆرن. ئنجا لەبەر ئەوەی خاوەنی سروشتێکی وایە کە زۆر شتی تێدا کۆکراوەتەوە، ئەوا ئەم مرۆڤە بووە بە تەوەرەی چەندین هیوا و ئاوات و ئارەزووی زۆر و، چاوەڕوانیی چەندین ئامانجی جیاجیا و جۆراوجۆر دەکات. هەروەها لەبەر ئەوەی کارمەندی و ئەرك و فەرمانبەرییە سروشتییەکانی گەلێ زۆرن، ئەوا ئامێرەکانی فراوانییان پەیدا کردووە. ئنجا بەهۆی ئەوەش کە سروشتەکەی بێ وێنەیە و بۆ چەندین جۆری پەرستش ئامادە کراوە، ئەوا توانایەکی پێ بەخشراوە کە دەتوانێت تۆوی "کامڵی" لە خۆیدا کۆ بکاتەوە!

لەبەر ئەمانە، هەرگیز ناگونجێ ئەم هەموو ئامێرە زۆرانە بەم زۆری و چڕییە، تەنها بۆ بەدەستهێنانی ئەم ژیانە فانی و کاتییەی دنیا بە مرۆڤ بەخشرابێت. بەڵکو دەبێ ئامانجی سەرەکیی ژیانی مرۆڤ بریتی بێت لە ئەنجامدانی ئەو کارمەندی و فەرمانبەرییانەی کە چەندین مەبەستی بێ سنووریان تێدایە و، بە بەندایەتی کردنی بۆ خوای گەورە دەستەوسانی و هەژاری و کەمتەرخەمی کردنی بەرامبەر بە خوای گەورە ڕابگەیەنێت و، بە ڕوانینێکی فراوان تەسبیحات کردنی بوونەوەران ببینێت و شایەتیش لەسەر ئەمە بدات و، ئەو چاکە و بەخشایشانەی کە میهرەبانیی خواوەند بەخشیونی و ناردوونی، بیانبینێت. تاکو شوکرانەیان لەسەر پێشکەش بکات و، موعجیزاتی توانستی پەروەردگارییانەش لەم بەدیهێنراوانەی خوادا ببینێت، تاکو بیریان لێ بکاتەوە و بە چاوی سەرسووڕمان و پەند لێ وەرگرتنەوە بۆیان بڕوانێت.

دەسا ئەی مرۆڤی دنیاپەرست و شەیدای ژیانی لەناوچووی دنیا و بێئاگا لە نهێنیی: ﴿أحسن تقويم﴾!

گوێ لەم ڕووداوە ئەندێشەییە ڕابگرە، کە ڕاستیی ژیانی دنیا دەنوێنێت و، ڕووداوێکە "سەعیدی کۆن" چاوی پێ کەوت و گۆڕیی بە "سەعیدی نوێ". کە بەم جۆرەیە:

خۆمم وەك مرۆڤێك دی کە لەسەر سەفەر بووم و بۆ شوێنێکی دوور ڕەوانە کرابووم و ڕێگایەکی دوورودرێژم لەبەربوو. گەورەکەشم شەست لیرەی زێڕینی (هەر ڕۆژە و لیرەیەك) بۆ تەرخان کردبووم. تا ڕۆژێکیان ڕۆشتمە ئوتێلێکەوە کە مەلهای تێدا بوو، منیش "دە" لیرەم ئەو کاتەدا پێ بوو، هەموویانم لە یەك شەودا لەسەر مێزی قومار و لە پێناوی ناوبانگ دەست

كه‌وتندا دۆڕاند و، به‌ ده‌ستی به‌تاڵ مامه‌وه‌ و هیچ كه‌سابه‌تێكم به‌ پاره‌كه‌مه‌وه‌ نه‌كرد و. هیچیشم نه‌هێشته‌وه‌ تاكو پێداویستی‌یه‌كانی ئه‌و جێگایه‌می پێ دابین بكه‌م كه‌ بۆی ده‌ڕۆم. به‌ كورتی: له‌و چێژ و تامه‌ ناڕه‌وایه‌ جگه‌ له‌ ئازار و تاوانی زۆر و زام و داخ و خه‌م و په‌ژاره‌ هیچی ترم لێ پاشه‌كه‌وت نه‌كرد.

كاتێ من له‌م نائومێدی و خه‌فه‌تباری و خه‌م خواردنه‌دا ده‌تلامه‌وه‌، پیاوێكم لێ په‌یدا بوو، وتی:

– (هه‌موو سه‌رمایه‌كه‌ت له‌ ده‌ست دا و ئێستا شایانی سزایت. وا به‌ ده‌ستی به‌تاڵیش به‌ره‌و ئه‌و شاره‌ی نیازته‌ بۆی بڕۆیت ڕێ ده‌گریته‌به‌ر. جا ئه‌گه‌ر وریا و خاوه‌نی بینایی دڵ بیت، ئه‌وا ده‌رگای په‌شیمان بوونه‌وه‌ و تۆبه‌كردن هێشتا دانه‌خراوه‌، ده‌توانیت به‌ نیوه‌ی قازانجی ئه‌و پازده‌ لیره‌یه‌ی كه‌ ماوته‌ كه‌سابه‌تی پێوه‌ بكه‌یت و، هه‌ندێ له‌ پێداویستی‌یه‌كانی ئه‌وێت بكڕیت).

كه‌ له‌مه‌دا ڕاوێژم به‌ نه‌فسم كرد، ده‌بینم ڕازی نی‌یه‌.. پیاوه‌كه‌ وتی: "كه‌واته‌ سێ‌یه‌كی". نه‌فسم به‌مه‌ش ڕازی نه‌بوو. پیاوه‌كه‌ وتی: "چواریه‌كی". ده‌بینم نه‌فسم نایه‌وێ له‌و خووه‌ی دووچاری بووه‌ لابدات! پیاوه‌كه‌ به‌ تووڕه‌یی‌یه‌وه‌ پشتی تێ كردم و ڕۆشت.

پاشان كه‌ ته‌ماشام كرد، وه‌ك بڵێی هه‌موو شتێك گۆڕرا بێت و وه‌ك خۆی نه‌مابێت، وا بوو له‌ به‌رچاومدا! خۆمم له‌ناو شه‌مه‌نده‌فه‌رێكدا دی كه‌ به‌وپه‌ڕی توندی و به‌ په‌له‌ له‌ تونێلێكی ناوزه‌وی‌دا ده‌ڕۆشت، له‌ سه‌رسووڕماندا شپرزه‌ بووبووم. به‌ڵام هیچ چارێكم نه‌بوو و نه‌مده‌توانی نه‌ به‌ لای ڕاست نه‌ به‌ لای چه‌پدا بڕۆم. سه‌یر له‌وه‌دا بوو له‌م دیو و ئه‌و دیوی شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌كه‌دا چه‌ندین جۆر گوڵی ڕه‌نگین و جوان و سه‌رنجڕاكێش و به‌روبووم و میوه‌ی به‌تام دیار بوون. منیش وه‌كو مرۆڤه‌ ده‌به‌نگه‌كان ده‌ستم بۆ بردن تاكو هه‌ندێ له‌و گوڵانه‌ بكه‌مه‌وه‌ و له‌و میوه‌ به‌تامانه‌ش شتێكم ده‌ست بكه‌وێت. به‌ڵام هیچم ده‌ست‌نه‌كه‌وت، چونكه‌ هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی ده‌ستم پێیان گه‌یشت، درِكه‌كانیان به‌ ده‌ستمدا چه‌قین و ده‌ستیان زامدار كردم و خوێنیان لێ هێنا و، شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌كه‌ش له‌ ڕه‌وتی توند و تیژی خۆی‌دا هه‌ر به‌رده‌وام بوو! به‌م جۆره‌، بێ ئه‌وه‌ی هیچ سوودێكم ده‌ست بكه‌وێت خۆم تووشی ئازار كرد.. فه‌رمانبه‌رێكی شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌كه‌ پێی وتم: (پێنج قرووشم بده‌رێ، تا ئه‌ندازه‌یه‌كی باشت له‌و گوڵ و به‌روبوومانه‌ی ده‌ته‌وێ بۆ بكه‌مه‌وه‌. خۆ تۆ به‌م زامانه‌ت چه‌ندین ئه‌وه‌نده‌ی ئه‌وه‌ی به‌و پێنج قرووشه‌ ده‌ست ده‌كه‌ون زیان ده‌كه‌یت، ئه‌مه‌ سه‌ره‌ڕای ئه‌و سزایه‌ی كه‌ له‌سه‌ر ئه‌م كاره‌ت ده‌یچێژیت، چونكه‌ بێ ڕوخسه‌ت وه‌رگرتن ده‌ستت بۆ بردوون).

لەو کاتەدا سەری دنیام لێ هاتەوەیەك و بە تەواوی کەوتمە پەژارە و تەنگانەوە. لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی لای پێشەوەم کرد، تاکو بزانم کەی ئەم تونێلە کۆتایی پێ دێت؟ دەبینم کۆتایی ئەو تونێلە چەند کون و کەلەبەر و پەنجەرە و چالێکن و، هەریەك لە نەفەرەکانی ئەو شەمەندەفەرە فڕێ دەدرێنە ناو یەکێك لەو کون و چالانەوە! لە بەرامبەر خۆیشمەوە چالێکم دی لە هەردوو سەریەوە بەردی وەك "کێلی گۆڕ" دانرابوون. کە لە بەردەکانی وردبوومەوە، دەبینم بە پیتی گەورە ناوی "سەعید"یان لێ نووسرابوو! لە ترس و بیم و سەرسووڕماندا بە دەنگی بەرز وتم: ئەی هاوار!!

کتوپڕ دەنگی ئەو پیاوەم هاتەوە گوێ کە لە دەرگای مەلهاکەدا ئامۆژگاریی زۆری کردم. گوێم لێ بوو پێی وتم:

- کوڕم! ژیریت هاتەوەبەر؟ لە مەستی بێدار بوویتەوە؟

وتم:

- بەڵێ، بەڵام دوای ئەوەی کە کار لە کار ترازا و هیچ هێز و توانا و دەستەڵاتێکم لە دەستدا نەما.

وتی:

- تۆبە بکە و پشت بەخوا ببەستە.

وتم:

- وا کردم.

پاشان کە بێدار بوومەوە، "سەعیدی کۆن"م لێ ون بوو و، "سەعیدی نوێ"م لە خۆمدا بینی!

لە خوا داواکارم ئەم ڕووداوە ئەندێشەیی‌یە بکات بە مایەی خێر. وا من هەندێکی لێك دەدەمەوە بۆت، ئەوی تریشی خۆت لێکی بدەرەوە:

ئەو سەفەرە، سەفەری مرۆڤە کە لە جیهانی ڕۆحەوە دەست پێ دەکات و، بەناو پلەکانی جیهانی ڕەحم و، پاشان لاوی و، پیری و، گۆڕ و، بەرزەخەوە دەڕوات و، بەرەو حەشر و سیرات و هەتاهەتایی بەردەوام دەبێت.

شەست لیرەکەش تەمەنی مرۆڤە کە شەست ساڵە. خۆ کاتێ لە تەمەنی چل و پێنج ساڵی‌دا ئەو ڕووداوە ئەندێشەیی‌یەم دی، هیچ بەڵگەیەکم بە دەستەوە نەبوو کە تا تەمەنی شەست ساڵی دەژیم، بەڵام یەکێك لە قوتابی‌یە دڵسۆزەکانی قورئان ڕێنمایی کردم بۆ ئەوەی کە نیوەی ئەو تەمەنەی بە ئەغلەب ماومە و دەکاتە پازدە ساڵ، لە پێناوی دواڕۆژدا بەکاری بهێنم..

ئه‌و ئوتێله‌ش، سه‌باره‌ت به‌ من، شاری ئه‌سته‌مبووڵه‌..

ئه‌و شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌ش: كاته‌. هه‌ر ساڵێك وه‌ك عه‌ره‌بانه‌یه‌كی ئه‌و شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌ وایه‌.

ئه‌و تونێله‌ش ژیانی دنیایه‌.. گوڵ و میوه‌ درِكاوی‌یه‌كانیش: له‌زه‌ته‌ نارِه‌وا و گاڵته‌ و گه‌په‌ حه‌رامه‌كانن، كه‌ ته‌نها ئازاری بیركردنه‌وه‌ له‌ نه‌مانیان دڵ و ده‌روون زامدار و خوێناوی ده‌كات..

واتای ئه‌و قسه‌یه‌ی خزمه‌تگوزاری ناو شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌كه‌یش كه‌ وتی: "پێنج قرووشم بده‌رێ با باشترین شتێك كه‌ ده‌ته‌وێ بت‌ده‌مێ" ئه‌وه‌یه‌ كه‌: ئه‌و تام و چێژ و له‌زه‌تانه‌ی مرۆڤ له‌ رێی حه‌ڵاڵه‌وه‌ ده‌ستی ده‌كه‌ون، سه‌رو زیادن بۆ گوزه‌ران و حه‌وانه‌وه‌ی. ئیتر رێگا به‌ حه‌رام نادەن و پێویست به‌ حه‌رام ناهێڵنه‌وه‌..

ئه‌وانی تریش خۆت لێكیان بده‌ره‌وه‌.

**○ سه‌رنجی چواره‌م:**

مرۆڤ له‌م گه‌ردوونه‌دا وه‌ك مناڵێكی لاوازی نازدار و خۆشه‌ویست وایه‌، ئه‌وه‌تا له‌ دووتوێی لاوازی‌یه‌كه‌ی‌دا هێزێكی گه‌وره‌ و، له‌ كۆڵه‌واری‌یه‌كه‌یشی‌دا توانایه‌كی مه‌زنی هه‌یه‌! چونكه‌ به‌هۆی هێزی ئه‌و لاوازی و توانای ئه‌و ده‌سته‌وسانی و كۆڵه‌واری‌یه‌وه‌، ئه‌م بوونه‌وه‌رانه‌ی خراونه‌ته‌ ژێر ده‌ست و هه‌موویانی بۆ ژێربار و ملكه‌چ كراون! جا ئه‌گه‌ر مرۆڤ هه‌ست به‌ لاوازیی خۆی بكات و، به‌ زمان و كردار و رِه‌فتار له‌ په‌روه‌ردگاری خۆی بپارِێته‌وه‌ و، به‌ كۆڵه‌واریی خۆی بزانێت و، هانا بۆ په‌روه‌ردگاری ببات و، شوكرانه‌بژێریی ئه‌وه‌ش پێشكه‌ش به‌ خوا بكات كه‌ بوونه‌وه‌رانی بۆ ملكه‌چ و ژێربار كردووه‌.. ئه‌وا به‌ ئامانجه‌كانی ده‌گات و، ئاوات و مه‌به‌سته‌كانی دێنه‌دی. كه‌ ئه‌گه‌ر به‌ توانای هه‌نده‌كی و كه‌می خۆی بوایه‌ هه‌رگیز نه‌یده‌توانی به‌ڵكو بۆی مه‌یسه‌ر نه‌ده‌بوو یه‌ك له‌ سه‌دی ئه‌وه‌ی ده‌ست بكه‌وتایه‌ كه‌ ده‌ستی كه‌وت.

به‌ڵام هه‌ندێ جار مرۆڤ به‌ هه‌ڵه‌دا ده‌چێت و، ئه‌وه‌ی كه‌ به‌هۆی پارِانه‌وه‌ی (زمانی حاڵ و رِه‌فتار) ده‌ستی كه‌وتوون، به‌ هی توانای خۆی له‌ قه‌ڵه‌میان ده‌دات! بۆ نموونه‌: ئه‌و هێزه‌ی كه‌ له‌ لاوازیی جوجكی مریشكدا هه‌یه‌، وا له‌ دایكه‌كه‌ی ده‌كات كه‌ به‌و هێزه‌ی هه‌یه‌تی له‌گه‌ڵ شێردا بجه‌نگێت و به‌و چه‌شنه‌ پارێزگاریی ئه‌و جووجه‌ڵانه‌ی بكات.. هه‌روه‌ها ئه‌و هێزه‌ی كه‌ له‌ لاوازیی بێچووی شێردایه‌، دایكه‌ درِنده‌كه‌ی بۆ خۆی ژێربار ده‌خات و ده‌یكات به‌ خزمه‌تگوزاری خۆی، به‌ رِاده‌یه‌ك كه‌ ئه‌م بێچووه‌ هه‌رچه‌ند بچووك و لاوازه‌، كه‌چی هه‌رده‌م تێره‌، به‌ڵام دایكه‌كه‌ی به‌ برسێتی ده‌مێنێته‌وه‌!

ئەم هێزەی کە لـە لاوازیدایـە جێـی سـەرنجدانە و، ئـەو میهرەبانی‌یـەش کـە لـە لاوازی‌یـەوە سەرچاوە دەگرێت و دەردەکەوێت، شایانی سەیر کردن و سەرسوورمانە!

جا هەروەك منالّی نەرمونۆڵ و ناسکی خۆشەویسـت بـەهۆی گریـان و لاوازی‌یەکەیـەوە، بـەزەیی و سـۆزی کـەسـانی دەوروبـەری دەسـت دەکـەوێت و بـە مـەرام و مەبەسـتەکانی دەگـات و، زلـهێزان و پادشـایانی بـۆ ملکـەچ دەبـن و، بـەم بۆنەیـەوە ئـەوەندەی دەسـت دەکەوێت کە هەرگیز بە هێزە کەمەکەی خۆی یەك لە هـەزاری ئـەوەی دەست نەدەکـەوت. واتە لاوازی و کۆڵەواری‌یەکەی هۆی ئەوەن بەزەیی خەڵکی بجووڵێنن و پارێزگـاریی بکـەن، بە رادەیەك کە بە تەنها پەنجەیەکی بچووکی، گەورەپیاوان و میر و پادشایانی بۆ ملکەچ دەبن. خۆ ئەگەر ئەم منالّە نکوولی لەو بەزەیی‌یە بکات و، ئەو پارێزگاری‌یەش تاوانبار بکات و، بە نـەفامی و لـەخۆبایی بوونـەوە بڵێـت: "مـن بـە هـێز و توانـا و ویستی خـۆم ئـەو هـەموو مرۆڤـە دەستەڵاتدارە بەتوانایانەم ملکـەچ کـردوون"، دیـارە جگـە لـە زللـە لێـدان شـایانی هیچـی تـر نابێت..

هەروەك ئەم منالّە لەم نموونەیەدا ئاوایە، مرۆڤیش وەهایە! چونکە ئەگەر مرۆڤ نکوولی لـە میهرەبانی و بەزەیی بەدیهێنـەری خـۆی بکـات و، دانـایی خـوای گـەورە تاوانبـار بکـات و بە وێنـەی قاروون ئەویش بڵێت: ﴿إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْـــمٍ عِنـــدِي﴾ (القصـص:٧٨) واتـە: ئـەم سـەروەت و سامانەم بـەهۆی زانستێکی خۆمـەوە دەست کـەوتووە، ئـەوا بێ گومـان خـۆی دووچـاری ئەشکەنجە و ئـازار دەکـات. چونکـە ئـەو پلـە و پایـە و دەستەڵاتداری‌یەی مـرۆڤ هەیەتی و، ئەم پێشکەوتن و ئاسۆ شارستانێتی و ژیـارەی مرۆڤـی تێدایـە، هـی بـەرزی و هـێزی دەمقالّی و زاڵ بوونی نی‌یە و، هیچ کام لەمانە هەرگیز ئەو شتانەی دەست نەخستوون. بەڵکو لـەبەر لاوازی و کۆڵـەواری و هـەژاری و دەسـت کورتیـی مـرۆڤ یارمـەتی دراوە و چاکـەی لـەگەڵدا کراوە و ئەمانەی پێ بەخشراوە و رێزی لـێ گیراوە.. هەروەها هۆی ئەو دەستەڵاتەی کە هەیەتی هەرگیز ئەو هێز و زانیاری‌یە نی‌یە کە لە توانای‌دا هەیە، بـەڵکو تەنـها میـهرەبانی و دانایی خواوەندی پەروەردگارە کە ئەم هەموو شتانەی بۆ ژێربار خستووە و داونی بـە دەست مرۆڤەوە.

بەڵێ، ئەو مرۆڤەی کە لە بەردەم دووپشکێکی کوێر و مارێکی بێ پێ‌دا دەسـتەپاچە بێـت، هەرگیز خاوەنی ئەو توانایە نی‌یە کە لە کرمێکی بچووك بـەرگی ئاورێشـمی بکاتـە بـەر و، لـە مێروویەکی ژەهراویش هەنگوینی دەرخوارد بدات! بەڵکو تەنها ئـەنجامی لاوازی‌یەکـەتی کـە خوای میهرەبان و پەروەردگاری بەخشندە، ئەوانەی بۆ گوێڕایەڵ کردوون!

ئه‌ی كاكی مرۆڤ! مادەم ڕاستی بەم جۆرەیە، ئەوا واز لە خۆویستی و لەخۆبایی بوون بهێنە و، لە بەردەم دەرگای خوایەتیی خوای گەورەدا كۆڵەواری و دەستەوسانی و لاوازیت بە زمانی داوا و پاڕانەوە ڕابگەیەنە و، بە زمانی نزا و لالانەوەش هەژاری و دەست كورتیت ئاشكرا بكە و، دەری ببڕە كە بەندەیەكی ڕاستەقینەی بێ گەردی خوای گەورەیت و بڵێ: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ﴾ و، ئیتر بۆ خۆت بە پلەكانی سەربەرزیدا سەربكەوە!

هەرگیز نەڵێیت: (من چیم و بایەخم چییە، تا لە لایەن خواوەندی داناوە بە تایبەتی چاودێری بكرێم و ئەم گەردوونەم بۆ ملكەچ بكرێت و، پاشان داوای شوكرانەبژێرییەكی گشتیم لێ بكرێت)؟! نەخێر هەرگیز وا نەڵێیت. چونكە هەرچەند بە گوێرەی دەروونی خۆت و شێوەی ڕواڵەتیت وەك نەبوو وایت، بەڵام بەپێی پلە و فەرمانبەریی ژیانت. سەیركەرێكی وریایت و دەڕوانیتە ئەم بوونەوەرە مەزنانە و.. زمانێكی گۆیای ڕەوانیت كە بە ناوی ئەم هەموو بوونەوەرە پڕ لە داناییانەوە دەدوێیت و،.. خوێنەرێكی وریای ئەم كتێبەی گەردوون و جیهانیت و.. سەرپەرشتیكارێكی بیركەرەوەی ئەم بوونەوەرە تەسبیحات گوزارەیت و، لە حوكمی مامۆستایەكی شارەزا و ئەندازیارێكی بەڕێزدایت بۆ ئەم هەموو بەدیهێنراوانەی كە خەریكی بەندایەتین و سەریان لە سوژدەدایە.

بەڵێ، ئەی كاكی مرۆڤ! تۆ لە ڕوانگەی جەستەی ڕووەكی و دەروونی ئاژەڵیتەوە. لەناو شەپۆلەكانی ئەم بوونەوەرە زۆر و سەرسووڕهێنەرانەدا، بەشێكی بچووك و كەم و بێ نرخ و، بەدیهێنراوێكی هەژار و زیندەوەرێكی لاوازیت.. بەڵام لەو ڕووەی كە مرۆڤایەتییەكەت بە پەروەردەی ئیسلامی تەواو بوو بێت و، بە ڕووناكیی ئیمان، كە ڕووناكیی خۆشەویستیی خوای تێدایە، ڕوون بووبێتەوە، ئەوا لەم بەندایەتییەتدا پادشایت و، لەم هەندەكیبوونەتدا هەمەكییت و، لەم بچووكییەتدا جیهانێكی فراوانیت و، لەگەڵ كەم نرخیتدا پلەیەكی بەرزت هەیە، چونكە تەنها تۆ سەرپەرشتیكاری (خاوەن بەسیرەتی ڕوونی) ئەم بازنە فراوانەی بوونەوەرانیت كە لە بەرچاودایە، بە ڕادەیەك كە دەتوانیت بڵێیت:

(پەروەردگاری میهرەبانم ئەم دنیایەی بۆ كردووم بە ماڵبەند و، مانگ و ڕۆژ بە چرا و ڕووناكی و، بەهار بە چەپكێ گوڵی دڵڕفێنی جوان و، هاوینیش بە سفرە و خوانێكی پڕ لە ناز و نیعمەت و، ئاژەڵیشی بۆ كردووم بە خزمەتگوزاری بەردەست و، ڕووەكیش بە جوانی و ئارایشتی ناوماڵم).

پوختەی قسە ئەوەیە كە: ئەگەر گوێڕایەڵی نەفس و شەیتان بیت، ئەوا دەكەویتە خوارەوە و دادەبەزیتە نزمترین پلە(أسفل سافلين)وە، بەڵام ئەگەر گوێ بۆ حەق و قورئان

ڕابگریت، ئەوا بەرەو باڵاترین پلەی بڵندی(أعلى عليين) بەرز دەبیتەوە و دەبیت بە جوانترین بوونەوەری نرخێنراو(أحسن تقويم)ی ئەم گەردوونە.

**○ سەرنجی پێنجەم:**

مرۆڤ وەکو میوان و کارمەندێك نێرراوەتە دنیا و، لێهاتوویی و بەهرەی زۆر گرنگی دراوەتێ و، لەبەر ئەمەش چەندین ئەرك و کارمەندیی گەورە و گرنگی پێ سپێرراوە.

جا بۆ ئەوەی مرۆڤ کارەکانی ئەنجام بدات و، بۆ ئەو ئامانج و کارمەندییە گەورانە تێبکۆشێت، ئەوا شەوقی بۆ کرداری چاك و، هەڕەشەی سامناکی لەسەر کرداری نابەجێ بۆ دانراوە. وا لێرەدا و لە پێناوی هەست کردن و تێگەیشتن لە نهێنیی: "أحسن تقويم"، کارمەندییەکانی مرۆڤ و بناغەکانی بەندایەتی، کە لە جێگایەکی تردا بە درێژی باسمان کردوون، بە کورتی باس دەکەین و، دەڵێین:

دوای ئەوەی کە مرۆڤ دێتە ئەم جیهانە دوو لایەنی بەندایەتی و پەرستن هەن دەبێ ئەنجامیان بدات:

**لایەنی یەکەم:** پەرستن و تێفکرینی غیابی(نادیار).

**لایەنی دووهەم:** پەرستن و پاڕانەوەی ئامادە و ڕووبەڕوو.

*لایەنی یەکەم:* بریتییە لەوەی کە لە ڕێی گوێڕایەڵییەوە تەسدیقی ئەو دەستەڵاتدارییەی خواوەند بکات کە لە گەردووندا دیار و ئاشکرایە و، بە سەرسووڕمان و ڕێز لێگرتنەوە سەیری کەماڵ و جوانییەکانی پەروەردگار بکات..

پاشان پەند و دەرس و ئامۆژگاری لە نەخش و نیگارە ناوازەکانی ناوە جوان و بێ گەردەکانی خواوەند وەربگرێت و ڕایان بگەیەنێت و بڵاویان بکاتەوە..

پاشان گەوهەر و مروارییی ناوە پەروەردگارییەکان - کە هەریەکەیان گەنجینەیەکی نهێنی و مەعنەوین - بە تەرازووی هەست و ئیدراك و بینایی دەروون لێك بداتەوە و، بە ڕووناکیی: ڕێزلێنان و گەورەیی و میهرەبانی، کە لە دڵەوە دێن، هەڵیانبسەنگێنێت..

پاشان لە کاتی خوێندنەوە و موتالاکردنی پەڕەکانی ئاسمان و زەوی و لاپەڕەکانی بوونەوەراندا، کە نووسراوانی قەڵەمی توانستی خواوەندن، بە ڕێزلێنان و سەرسووڕمانەوە تێ بفکرێت..

پاشان کە سەیری جوانیی بوونەوەران و بەدیهێنراوە ناسکۆڵە و جوانەکانی بوونەوەران دەکات، بەلایەوە جوان بن و، نرخی شیاویان لەو سەیرکردنەدا بۆ دابنێت و، حەز بکات بەدیهێنەری جوانی ئەو بوونەوەرانە بناسێت و، بە پەرۆشەوە هەوڵی ئەوە بدات کە بگاتە پلەی حوزوور و خزمەت بەدیهێنەری خاوەن کەماڵ و، ئاوڕلێدانەوەی پەروەردگار بەدەست بهێنێت.

*لایەنی دووهەم:* بریتی‌یە لە پلەی حوزوور و ئەو گفتوگۆیەی کە لە شوێنەوارەوە دەڕوات بۆ کاریگەر..

دەبینێت: بەدیهێنەرێکی مەزن دەیەوێت لە ڕێی موعجیزاتی بەدیهێنراوانی خۆیەوە، خۆی بناسێنێت. ئەمیش بەرامبەر بەمە، ئیمانی پێ دەهێنێت و دەیناسێت..

پاشان دەبینێت: پەروەردگارێکی میهرەبان دەیەوێت بە بەروبوومە شیرینەکانی میهرەبانیی خۆی، خۆی لەلا خۆشەویست بکات. ئەمیش لە بەرامبەر ئەمەوە، بە خۆشەویستی و بەندایەتیی بێ گەرد و پاك خۆی لە لا خۆشەویست دەکات..

پاشان دەبینێت: بەخشندەیەکی سەخاوەتمەند، لە تام و لەزەتی نیعمەتی ماددی و مەعنەوی‌دا نوقمی دەکات. ئەمیش بەرامبەر بەمە، بە کردار و حاڵ و گوفتار و گەر بۆی بکرێت بە گشت هەست و ئامێرەکانیشی، سوپاسگوزاری و شوکرانەبژێریی پێشکەش دەکات..

پاشان دەبینێت: خواوەندێکی جوان و مەزن لە ئاوێنەی ئەم بوونەوەرانەدا گەورەیی جوانیی خۆی، بە جۆرێکی سەرنج ڕاکێش، دەردەخات. ئەمیش لە بەرامبەر هەموو ئەمانەدا: "الله اکبر.. سبحان الله" دووپات دەکاتەوە و، بێ هیچ بێزاربوونێك و، بەوپەڕی ڕێز و سەرسوورمان و، بە خۆشەویستی‌یەکی تواوەی ناو خۆنەویستی، سوژدەی بۆ دەبات..

پاشان دەبینێت: دەوڵەمەندێکی ڕەها سامانە بێ کۆتایی و گەنجینە نەبڕاوەکانی خۆی بەوپەڕی سەخاوەتمەندی دەخاتە ڕوو. ئەمیش لە بەرامبەر ئەمەوە، بەوپەڕی هەژاری و بە کەماڵی ڕێز و ستایش، داخوازی و داواکاری‌یەکانی خۆی پێشکەش دەکات..

پاشان دەبینێت: ئەو بەدیهێنەرە شکۆمەندە زەویی کردووە بە پیشانگایەکی سەیری بەدیهێنراوە سەرسووڕهێنەر و نایابەکانی خۆی. ئەمیش لە بەرامبەر ئەمەوە، کە سەیری ئەو پیشانگایە دەکات بە لایەوە جوان دەبێت و "ما شاء الله" دەکات و، ڕێز و نرخی شایانی خۆیان دەداتێ و "بارك الله" دەڵێت و بە "سبحان الله" کردن سەرسووڕمانی خۆی دەردەخات و، بە "الله اکبر" وتنیش ڕێز و گەورەیی خواوەندی بەدیهێنەریان دەردەبڕێت..

پاشان دەبینێت: خوایەکی تاکی تەنیا بە مۆری یەکتایی(توحید)، کە بە هیچ کەسێك لاسایی ناکرێتەوە، هەموو بوونەوەران مۆر دەکات و نیشانەی یەکتایی بەدیهێنەریان لەسەر دەنەخشێنێت و ئاڵای "یەکتایی" لەسەر هەموو ئاسۆکانی جیهان هەڵدەکات و، بەمەش پەروەردگاریتیی خۆی ڕادەگەیەنێت. ئەمیش لە بەرامبەر ئەمانەوە، تەسدیق و ئیمان و یەکتاپەرستی و ملکەچی و شایەتمان و بەندایەتی، ڕادەگەیەنێت.

مرۆڤ، بەم جۆرە پەرستن و بیرکردنەوانە، دەبێت بە "مرۆڤی ڕاستەقینە" و، دەری دەخات کە لە: جوانترین شێوە و باشترین نرخ و بەهادایە و، بە بۆنەی پێت و بەرەکەتی ئیمانەوە، شایانی هەڵگرتنی ئەمانەتی گەورە و جێنشینی دەستپاکی سەرزەوی دەبێت.

دەسا ئەی ئەو مرۆڤە بێئاگایەی کە لە: "احسن تقویم"دا بەدی هێنراوە، بەڵام لەبەر سەرەڕۆیی و ویستی خراپی خۆی، بەرەو "اسفل سافلین" بەر دەبێتەوە! بە باشی گوێم لێ ڕابگرە و، سەیری ئەو دوو تابلۆیە بکە کە لە مەقامی دووهەمی "وتەی حەڤدەهەم"دا نووسراون. تاکو بە چاوی خۆت ببینیت کە چۆن منیش وەك تۆ دنیام خۆش و شیرین دەهاتە بەرچاو، کاتێ کە لە مەستی و بێئاگایی لاویدا بووم. بەڵام کاتێ لە بەرەبەیانی پیریدا لە مەستیی لاوی بێدار بوومەوە، ئەو ڕووەی دنیا کە ڕووی لە دواڕۆژ نییە و من بە جوانم دەزانی، بینیم ڕوویەکی تابلێی ناشیرینە. جا بۆ ئەوەی مەودای جوانیی ئەو ڕووەی دنیا ببینیت کە ڕووی لە دواڕۆژە، ئەوا سەیری ئەو دوو تابلۆیە بکە لە کتێبی (وتەکان)دا.

*تابلۆی یەکەم*: دنیای "بێئاگایان" پیشان دەدات. من بێ ئەوەی تیایدا مەست ببم، بینیم ئەم دنیایە لە دنیای گومڕایان دەچێت، کە پەردەکانی "بێئاگایی" بە تەواوی داپۆشیون.

*تابلۆی دووهەم*: ئاماژە بۆ ڕاستیی دنیای "ئەهلی هیدایەت" و خاوەنی دڵانی دڵنیا دەکات.

هیچ دەستکارییەکی ئەو دوو تابلۆیەم نەکرد. بەڵکو لە پێشدا چۆن بوون هەر بەو جۆرە هێشتمنەوە. خۆ هەرچەندەش لە شیعر دەچن، بەڵام شیعر نین.

**﴿سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.**

**﴿رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ۞ وَيَسِّرْ لِي أَمرِي ۞ واحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسانِي ۞ يَفْقَهُوا قَوْلِي﴾.**

اللهم صل على الذات المحمدية اللطيفة الأحدية، شمس سماء الأسرار، ومظهر الأنوار ومركز مدار الجلال، وقطب فلك الجمال. اللهم بسره لديك، وبسيره اليك، آمِنْ خوفي، وأَقِلْ عثرتي، وأذْهِب حزني وحرصي، وكن لي، وخذني إليك مني، وارزقني الفناء عني، ولا تجعلني مفتوناً بنفسي، محجوباً بحسي، واكشف لي عن كل سر مكتوم. يا حي يا قيوم، يا حي يا قيوم، يا حي يا قيوم. وارحمني وارحم رفقائي، وارحم أهل الإيمان والقرآن. آمين يا أرحم الراحمين ويا أكرم الأكرمين.

**﴿وآخِرُ دعواهم أن الحمدُ للهِ ربِّ العالمين﴾.**

# وتەی بیست و چوارەم

**(ئەم وتەیە پێنج لقی لـێ بووەتەوە. بە وردی سەرنجی لقی چوارەم بدە و، دەست بە لقی پێنجەمەوە بگرە و، سەربکەوە با بەروبوومەکانی بچنیت)**

بسم الله الرّحـــمن الرّحیم

**﴿اللهُ لا إِلهَ إِلاّ هُوَ لَهُ الأَسماءُ الْحُسنى﴾** (طه:٨)

**ئاماژە بۆ پێنج لقی تەنها یەك ڕاستیی نێوان ڕاستی‌یە هەرە مەزنەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکەین**

## لقی یەکەم

"پادشـا"ی دنیـایی لـە نـاوەندی فەرمانگـەکانی حکوومەتەکـەی‌دا چـەند ناونیشـانیکی جیاجیـای هەیـە و، لـە نێـوان چینـەکانی ڕەعیەتـەکانی‌دا چـەند وەسفێکی جۆراوجـۆری بـۆ دادەنرێـت و، لـە توێـی یـەك بـە یـەکی پلـەکانی پادشایی‌یەکەشی‌دا خـاوەنی چـەند نیشـانە و ناوێکی جیاجیایە. بۆ نموونـە: لـە فەرمانگـەکانی دادگـەری‌دا خـاوەنی نـاوی: "فـەرمانڕەوای دادگەر"ە و.. لە فەرمانگە مەدەنی‌یەکاندا بە ناونیشانی "پادشـا" دەناسرێـت و.. لـە فەرمانگـە سەربازی‌یەکاندا دارای ناوی: "سەرکردەی گشتی"یە و.. لە فەرمانگە شەرعی‌یەکانیشدا بـە ناونیشانی "خەلیفە" تەماشا دەکرێت.. بەم جۆرە، گەلـێ ناونیشان و ناوی تری هەیە..

کەواتـە "پادشـا" لـەناو هـەموو یـەکێك لـە فەرمانگـەکانی دەوڵەتەکـەی‌دا پلـە و پایـە و کورسی‌یەکی ئەوتۆی هەیە کە بە وێنەی عەرشێکی مەعنەویی ئەو وان. جا لەسەر ئەم بناغەیە. دەکرێـت ئـەم پادشـا تـاك و تەنیایـە لـە نێـوان فەرمانگـەکانی ئـەو پادشایەتی‌یە و لـە نـاوەندی چینەکانی حکوومەتدا خاوەنی هەزار و یەك ناو بێـت، واتە دەگونجێـت هـەزار و یـەك عەرشـی

هاوچەقی یەك لەناو یەكی ببێت، بە ڕادەیەك كە دەڵێی ئەو پادشا فەرمانڕەوایە لە هەموو یەكێكی فەرمانگەكانی دەوڵەتەكەیدا ئامادەیە و بە كەسێتی‌یە مەعنەوی‌یەكەی و تەلەفۆنە تایبەتی‌یەكەی ئاگای لە ڕووداوەكانی یەك بە یەكیانە و، بە یاسا و ڕێساكانی خۆیشی و لە ڕێی نوێنەرەكانیەوە لە هەموو یەكێكی ئەو چینانەدا دەبینرێت و خۆیشی هەموویان دەبینێت و، بە دانست و زانست و هێزی خۆی لە پشت پەردەوە هەموو پلەیەك لەو پلانە بەڕێوە دەبات. چونكە هەموو فەرمانگەیەك مەڵبەند و جێگای تایبەتی خۆی هەیە كە حوكمی هەریەكەیان لەوانی تر ناچێت و چینەكانیشیان لە یەكتر جیاوازە.

بەم جۆرە، پەروەردگاری هەموو جیهانەكان، كە پادشای ئەزەل و ئەبەدە، لە ناوەندی پلەكانی پەروەردگارێتی‌یەكەیدا گەلێ كاروبار و ناونیشانی جیاجیای هەیە، بەڵام هەموو یەكێك لەوانە بۆ یەكتری دەڕوانن..

هەروەها لە نێوان فەرمانگەكانی خوایەتی‌یەكەیدا چەند نیشانە و ناوێكی جۆراوجۆری هەیە، بەڵام لە یەكتری‌دا دەبینرێن..

هەروەها لە توێی كار بەڕێ‌كردنە مەزنەكانی‌دا چەند درەوشانەوە و دەركەوتنێكی جیاوازی هەیە، بەڵام لە یەكتر دەچن..

هەروەها لەناو هەڵسوكەوتەكانی توانستەكەیشی‌دا چەند ناونیشانێكی هەمەجۆرەی هەیە، بەڵام هەریەكەیان ئەوانی تر دەناسێنێت..

هەروەها لە ناوەندی درەوشانەوەی سیفەتەكانی‌دا چەند مەزهەرێكی خاوێنی جیاجیای هەیە، بەڵام یەكتر دەردەخەن..

هەروەها لە نێوان درەوشانەوەی كارەكانی‌دا چەند هەڵسوكەوتێكی لەیەك نەچووی هەیە، بەڵام یەكتری تەواو دەكەن.

هەروەها لەناو سنعەت و بەدیهاتووەكانی‌دا چەند درەوشانەوەیەكی بەسام و شكۆ بۆ پەروەردگارێتی‌یەكەی هەیە، بەڵام هەریەكەیان چاوی لەوانی ترە.

لەگەڵ ئەمەشدا، لە هەموو یەكێكی جیهانەكانی گەردوون و لە هەموو تاقمێكی ناوی‌دا، ناونیشانێك لە ناونیشانەكانی ناوێكی جوانی خوای گەورە دەردەكەوێت و، لەو فەرمانگە و بازنەیەدا ئەو ناوە زاڵ و فەرمانڕەوا دەبێت و، ناوەكانی تر شوێنكەوتەی دەبن، بگرە لەناو ئەو ناوەدا دەبن.

پاشان ئەو "ناو"ە لە هەموو چینەكانی بوونەوەراندا (ئیتر ئەو چینە گەورە بێت یان بچووك، كەم بێت یان زۆر، چ تایبەتی بێت و چ گشتی) بە جۆرێكی تایبەتی دەردەكەوێت و پەروەردگارێتی‌یەكی تایبەتیشی دەبێت. واتە هەرچەند ئەو ناوە لە خۆی‌دا: "گشتی" و

"هه‌مه‌لایه‌نگیر"ه، كه‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا به‌ تایبه‌تی و ڕاسته‌وخۆ و به‌ گرنگی‌پێدانێكی زۆره‌وه‌ ڕووی له‌ شتێكی تایبه‌تی‌یه‌، ته‌نانه‌ت ده‌ڵێی ئه‌و ناوه‌ ته‌نها ڕووی له‌ خودی ئه‌و شته‌یه‌ و تایبه‌ته‌ پێیه‌وه‌.

زیاد له‌مانه‌ش، به‌دیهێنه‌ری مه‌زن هه‌رچه‌ند حه‌فتا هه‌زار په‌رده‌ی نوورانیی هه‌یه‌، كه‌چی له‌ هه‌موو شتێكه‌وه‌ نزیكه‌. بۆ ئه‌وه‌ی له‌مه‌ تێبگه‌یت، ده‌توانیت ناوی "الخالق" وه‌ربگریت و، ئنجا سه‌رنج له‌و په‌رده‌ زۆرانه‌ بده‌یت كه‌ له‌ نێوان پله‌كانی ناوی "الخالق"دان. هه‌ر له‌ دره‌وشانه‌وه‌ی ناوی "الخالق"ه‌وه‌ له‌تۆ - كه‌ پله‌یه‌كی جوزئی‌یه‌ و په‌یوه‌ندیی به‌ مه‌خلووقییه‌تـه‌وه‌ هه‌یه‌ له‌ ناوی "الخالق" دا - تا ده‌گاته‌ پله‌ی هه‌ره‌ مه‌زنی خالیقی سه‌رانسه‌ری هه‌موو جیهانه‌كان، كه‌ ناونیشانێكی ته‌واو مه‌زنه‌. واته‌ ده‌توانیت له‌ ده‌رگای مه‌خلووقییه‌ته‌وه‌ بگه‌یت به‌ دوا ده‌ركه‌وتن و دره‌وشانه‌وه‌كانی ناوی "الخالق" و، له‌ بازنه‌ی "صیفات" نزیك ببیته‌وه‌. به‌ مه‌رجێك بوونه‌وه‌ران واز لێ بهێنیت و له‌ پشتی خۆته‌وه‌ به‌جێیان بهێڵیت.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی په‌رده‌كان كونیله‌(مسام) و كه‌لێن و كه‌له‌به‌ریان تێدایه‌ و، كاروباره‌كانیش بۆ یه‌كتری ده‌ڕوانن و، ناوه‌كانیش به‌رامبه‌ر یه‌ك ڕاده‌وه‌ستن و، خۆنواندنه‌كانیش تێكه‌ڵی یه‌كتر ده‌بن و، ناونیشانه‌كانیش له‌گه‌ڵ یه‌ك ئاوێته‌ ده‌بن و، شتانیش وه‌ك یه‌ك ده‌رده‌كه‌ون و په‌یدا ده‌بن و، هه‌ڵسوكه‌وته‌كانیش پشتگیریی یه‌كتریان تێدایه‌ و، كاروباره‌كانی په‌روه‌ردگارێتیش تێهه‌ڵكێشی یه‌كترین.. ئه‌وا ده‌بێ ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ خوای گه‌وره‌ی له‌ ڕێی یه‌ك دانه‌ له‌و ناو و ناونیشان و په‌روه‌ردگارێتی‌یانه‌وه‌ ناسیوه‌، ئینكاریی ناونیشان و كاروبار و ناوه‌كانی تر نه‌كات و، بزانێت كه‌ خوا هه‌ر ئه‌و خوایه‌یه‌و.. گه‌ر په‌رده‌ له‌ ڕووی دره‌وشانه‌وه‌ی ناوه‌ جوانه‌كانی تر لانه‌درا و، نه‌یبینین و له‌ دره‌وشانه‌وه‌ی ناوێكه‌وه‌ بۆ هی ناوێكی تر نه‌یگواسته‌وه‌ و هه‌نگاوی نه‌نا، زیان به‌ خۆی نه‌گه‌یه‌نێت.

بۆ نموونه‌: ئه‌گه‌ر ئاسه‌واری ناوی: "الخالق، القدیر" ببینێت و ئاسه‌واری ناوی: "العلیم" نه‌بینێت، ده‌كه‌وێته‌ خواره‌وه‌ بۆ ناو گومڕایی "سروشت". له‌به‌ر ئه‌وه‌، ده‌بێ هه‌میشه‌ چاو به‌ ده‌وروبه‌ری خۆیدا بگێڕێت و بزانێت كه‌ هه‌ر خوا خوایه‌ و، دره‌وشانه‌وه‌ی خوای گه‌وره‌ له‌ هه‌موو شتێكدا ببینێت و، بته‌ گوێكانیشی: ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾ له‌ هه‌موو شتێكدا ببیستێت و، گوێیان لێ ڕابگرێت و، زمانیشی هه‌میشه‌ "لا إله إلا الله" دووپات بكاته‌وه‌ و ڕایبگه‌یه‌نێت كه‌: "لا إله إلا هو برابر میزند عالم"[(١)].

(١) واته‌: هه‌موو شتێكی ناو ئه‌م جیهانه‌ له‌ به‌رامبه‌ر یه‌كتره‌وه‌ (لا إله إلا الله) ده‌ڵێنه‌وه‌. (وه‌رگێڕ)

بەم جۆرە، قورئانی پیرۆز بە ئایەتی پیرۆزی: ﴿اللهُ لآ إِلَهَ إِلاّ هُوَ لَهُ الأَسْمَاءُ الحُسْنَى﴾ ئاماژە بۆ ئەو ڕاستییانە دەکات کە باسمان کرد.

جا ئەگەر دەتەوێت لە نزیکەوە ئەو ڕاستییە بەرزانە ببینیت، ئەوا برۆ بۆ لای دەریایەکی هەڵچووی پڕ شەپۆل و زەوییەکی گرفتاری بوومەلەرزە و لێیان بپرسە: ئایا ئێوە دەڵێن چی؟ بێهیچ گومانێك دەبیستیت کە دەڵێن: "یا جلیل.. یا جلیل.. یا عزیز.. یا جبّار"..

پاشان برۆ بۆ لای جووچکە و بێچووی ئەو زیندەوەرانەی کە لە ناو دەریا یاخود لەسەر زەویدا دەژین و، بەوپەڕی سۆز و میهرەبانی پەروەردە دەکرێن، لێیان بپرسە: ئایا ئێوە دەڵێن چی؟ بێهیچ گومانێك هەست دەکەیت کە لەبەر خۆیانەوە دەڵێن: "یا جمیل.. یا جمیل.. یا رحیم.. یا رحیم"(١).

---

(١) تەنانەت من بە وردی سەرنجی پشیلەکانم دا، بینیم کە: دوای ئەوەی تێریان خوارد و یارییان کرد، خەویان لێ کەوت. لێرەدا ئەم پرسیارە بە زەینمدا هات: بۆچی بەم زیندەوەرە لە دڕندەچووانە دەوترێت: "زیندەوەرانی پاك و پیرۆز"؟ پاشان کە شەو ڕاکشام بۆ ئەوەی بخەوم، یەکێك لەو پشیلانە هات و لەسەر سەرینەکەم شانی دادا و، دەمی هێنایە لای گوێمەوە و، بە ئاشکرا و ڕاشکاوی دەستی کرد بە زیکری خوای گەورە و، وتی: "یا رحیم.. یا رحیم.. یا رحیم" وەك بڵێی ئەم پشیلەیە بە ناوی سەرجەم هاوڕەگەزەکانیەوە بەرپەرچی ئیعتیراز و وەڵامی پرسیارەکەمی دایەوە. کە ئەمەم لێ بیست، یەکسەر ئەم پرسیارە ڕووی لە ژیریم کرد کە: ئایا ئەم زیکرە تەنیا تایبەتە بەم پشیلەیەوە یان گشتییە بۆ هەموو پشیلەکان؟ هەروەها ئایا بیستنی زیکری ئەم پشیلەیە تایبەتە بە ڕەخنەگرێکی ناحەقی وەك منەوە یان هەموو مرۆڤێك گەر بە وردی گوێی لێ بگرێت دەتوانێت تا ڕادەیەك ببیستێت؟ لە بەیانیدا کە ڕۆژ بووەوە گوێم لە هەموو پشیلەکانی تر ڕاگرت، بینیم هەرهەموویان لە چەند پلەیەکی جیاجیادا هەمان زیکریان دووپات دەکردەوە، هەرچەند زیکرەکەیان وەکو هی پشیلەی یەکەم ڕوون و ئاشکرا نەبوو، چونکە لە سەرەتای مرەمرِی ئەواندا ئەم زیکرە جیا ناکرێتەوە و دەستنیشان ناکرێت، بەڵام وردە وردە لە نێوان مرەمرەکەیاندا دەتوانرێت "یا رحیم.. یا رحیم" جیا بکرێتەوە، پاشان وردە وردە هەموو مرەمرەکەیان تێکڕا دەبێت بە یەکپارچە: "یا رحیم.. یا رحیم" و بە زیکرێکی خەمناکی ئاشکرا ناوی خوای گەورە دەبەن، بێ ئەوەی پیتەکان دەربخەن. چونکە لەو کاتانەدا کە زیکری نیانی "یا رحیم" دەکەن، دەمی خۆیان دەگرن.

ئەم ڕووداوەم بۆ هەموو ئەو کەسانە گێڕایەوە کە هاتن بۆ سەردانم، ئەوانیش سەرنجی ئەمەیان دا و وتیان: تا ڕادەیەك ئێمەش دەیبیستین. پاشان ئەم پرسیارە ڕووی لە دڵم کرد: ئایا هۆی دەستنیشان کردنی ئەم ناوی: "یا رحیم"ە چییە و، لەبەر چی پشیلەکان بە تایبەتی بەم ناوە زیکر دەکەن و، بۆچی بە شێوە گوفتاری مرۆڤ دەیڵێن و وەك هی زمانی زیندەوەران نایڵێن؟ یەکسەر وەڵامی ئەم پرسیارە بەم جۆرە لە ڕووی دڵمدا کرایەوە کە: پشیلە ئاژەڵێکی نەرمونیانی چەشنی منالی بچووکە لەگەڵ مرۆڤدا و، لە هەموو گۆشەیەکی خانە و لانەکەیدا تێکەڵە، تەنانەت دەڵێی هاوڕێیەتی. کەواتە پێویستی بە گەلێ سۆز و میهرەبانیی زۆرە. جا هەرکات کە چاکە و ڕەفتاری نەرمونیانی لەگەڵدا دەکرێت، تەنها سوپاسی خوا دەکات و، بە پێچەوانەی سەگەوە، هۆکارەکان پشت گوێ دەخات و، لە جیهانە تایبەتییەکەی خۆیدا میهرەبانیی بەدیهێنەرە خاوەن سۆز و بەزەییەکەی ئاشکرا دەکات و، بەمەش مرۆڤی نوقمبووی خەوی "غەفلەت" لە خەو ڕادەپەڕێنێت و، هۆکارپەرستەکان بێدار دەکاتەوە و تێیان دەگەیەنێت کە: یارمەتی لە لایەن کێوە دێت و، ڕەحمەتیش لە کێوە چاوەڕوان دەکرێت؟! (دانەر)

پاشان گوێ له‌ ئاسمان ڕابگره‌ كه‌ چۆن هاوار ده‌كات: "یا جلیل ذو الجمـــــال"؟.. ئنجا گوێ له‌ زه‌وی ڕابگره‌ كه‌ چۆن ده‌ڵێت: "یا جمیل ذوالجلال"؟.. گوێ بۆ زینده‌وه‌ران بگره‌ كه‌ چۆن ده‌ڵێن: "یا رحـــمن یا رزاق"؟ پرسیار له‌ به‌هار بكه‌، بێ گومان لیێی ده‌بیستیت كه‌ ده‌ڵێت: "یا حنان.. یا رحـــمن.. یا رحیم.. یا كریم.. یا لطیف.. یا عطوف.. یا مصوِّر.. یا منوِّر.. یا محسن.. یا مزیِّن" ده‌بینیـت بـه‌م ناوانـه‌ و نـاوه‌ زۆره‌كـانی هاوچه‌شنیان، زیكر و یادی خوا ده‌كات..

هه‌روه‌ها هه‌ر مرۆڤێك، كه‌ به‌ ڕاستی مرۆڤ بێت، پرسیاری لـێ بكه‌ و ببینه‌ كه‌ چۆن نـاوه‌ جوانه‌كانی خوای گه‌وره‌ له‌ خۆی‌دا ده‌خوێنێته‌وه‌، ئه‌وه‌تا ئه‌و ناوه‌ جوانانه‌ له‌سـه‌ر ناوچـاوانی مرۆڤ نووسراون، ته‌نانه‌ت گه‌ر به‌ وردی سه‌رنج بده‌یت هـه‌ر خۆیشـت ئـه‌و ناوانـه‌ی له‌سـه‌ر ده‌خوێنیته‌وه‌.

ده‌ڵێیت سه‌رجه‌می گه‌ردوون مۆسیقایه‌كی هاوئاوازی زیكرێكـی مه‌زنـه‌، چونكـه‌ تێكـه‌ڵ بوونی بچووكترین و نزمترینی ئاوازه‌كان له‌گه‌ڵ گه‌وره‌ترین و به‌رزترینیاندا ، ئاوازێكی نیـانی به‌سام و شكۆ به‌رهه‌م دێنن ..

به‌ڵام مرۆڤ هه‌رچه‌نده‌ مایه‌ی لـێ‌ده‌ركه‌وتنی گشـت نـاوه‌ جوانـه‌كانی خـوای گه‌وره‌یـه‌، كه‌چی جۆراوجۆریی ناوه‌ جوانه‌كان بووه‌ به‌هۆی ئه‌وه‌ی كه‌ تا ڕاده‌یه‌ك مرۆڤیش جۆراوجـۆر بێت، به‌ وێنه‌ی جۆراوجۆریـی بوونـه‌وه‌ران و جیـاوازیی په‌رستشـی مه‌لائیكه‌تـه‌كان. ته‌نانـه‌ت لـه‌م جۆراوجۆری‌یـه‌ی مرۆڤـه‌وه‌ شـه‌ریعه‌ته‌ جیاجیاكـانی پێغه‌مبـه‌ران – علیـهم السـلام – و ته‌ریقه‌ته‌ له‌ یه‌كنه‌چووه‌كانی ئـه‌ولیاكان و مه‌شره‌به‌ جۆراوجۆره‌كـانی ئـه‌صفیاكان – خوایـان لـێ ڕازی بێت – سه‌ریان هه‌ڵداوه‌:

بۆ نموونـه‌: حـه‌زره‌تی عیسا – دروودی له‌سـه‌ر بێـت – زیـاتر نـاوی جوانـی: "القدیـر"ی له‌گه‌ڵ ناوه‌كانی تردا لـێ ده‌رده‌كـه‌وێت.. نـاوی جوانی "الـودود"یش زیـاتر به‌سـه‌ر ئـه‌هلی عیشقدا ده‌سه‌ڵاتدار و فه‌رمانڕه‌وایه‌.. ناوی جوانی "الحكیم"یش به‌سـه‌ر ئـه‌هلی بیركردنـه‌وه‌دا زاڵ و به‌ده‌سته‌ڵاته‌.

خۆ ئه‌گه‌ر پیاوێك له‌ یه‌ك كـاتدا زانـا و، ئه‌فسـه‌ر و، دادنـووس(كـاتب عـدل) و، پشـكنه‌ر بێت له‌ فه‌رمانگه‌كانی ده‌وڵـه‌تدا، ئـه‌وا لـه‌گـه‌ڵ هـه‌موو یـه‌كێكی ئـه‌و فه‌رمانگانـه‌دا پـه‌یوه‌ندیی هه‌یـه‌ و، لـه‌ هـه‌ر یه‌كێكیشـیاندا كـار و ئـه‌ركێكی لـه‌ ئه‌ستۆدایه‌ و، بۆ هــه‌موو یـه‌كێك لــه‌و كارانـه‌ش مووچـه‌ و پاداشتی بۆ دیـاری كـراوه‌، بـه‌ هـه‌مان جۆریـش دارای چـه‌ندین پلـه‌ی سه‌ركه‌وتن و به‌رزبوونه‌وه‌یه‌. ئه‌مه‌ سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه‌ گه‌لـێ حه‌سوود و نـه‌یار و دوژمنیشـی هه‌یه‌ كه‌ ده‌یانه‌وێت ته‌گه‌ره‌ له‌ به‌رده‌م كاره‌كانی‌دا دابنێن..

جا هەروەك ئەم پیاوەی کە ئەمە حاڵیەتی لە بەردەم پادشادا بە گەلێ ناونیشانی جۆراوجۆر دەردەکەوێت و، لە ناوەندی ئەو ناونیشانە جۆراوجۆرانەوە پادشا دەبینێت و، بە چەندین زمانی زۆر داوای پشتگیری و یارمەتیی لێ دەکات و، بە چەندەها ناونیشانی زۆر سەردانی دەکات و بۆ ڕزگاربوونیش لە شەڕی دوژمنانی، بە چەندەها شێوەی زۆر و زەبەندە پەنای پێ دەگرێت.

هەروەك ئەم پیاوە ئاوایە، "مرۆڤ"یش بە هەمان جۆرە، چونکە لەبەر ئەوەی بەهرەمەندی تیادەرکەوتنی گەلێ ناوی جوان بووە و، ئەرکی زۆری پێ سپێرراوە و، بە دوژمنی زەبەندەش گیرۆدە کراوە، ئەوا لە موناجات و خۆپەناگرتنیدا بە خوای گەورە لەتاو دوژمنانی، گەلێ ناوی جوانی خوا دەهێنێت. هەروەك پێغەمبەری خۆشەویست حەزرەتی محەممەد ﷺ کە مایەی شانازیی ئادەمیزاد و مرۆڤی کاملی ڕاستەقینەیە، بە هەزار و یەك ناوی جوان لە پاڕانەوە جوانەکەیدا کە ناوی "الجوشن الکبیر"ە، لە خوا پاڕاوەتەوە و پەنای پێ گرتووە لە ئاگری دۆزەخ.

ئا لەم نهێنی‌یەوەیە کە دەبینین قورئانی پیرۆز لە سوورەتی "الناس"دا فەرمان بە مرۆڤ دەدات لە ڕێی سێ ناونیشانەوە پەنا بە خوا بگرێت:

﴿**قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النّاسِ ۞ مَلِكِ النّاسِ ۞ إلهِ النّاسِ ۞ مِنْ شَرِّ الوَسْواسِ الخَنّاسِ**﴾ ..

هەروەها لە ﴿**بسم الله الرّحمن الرّحيم**﴾دا بە سێ ناوی جوانی خوای گەورە، داوای یارمەتی‌دانی مرۆڤ لە لایەن خواوە، ڕوون دەکاتەوە.

# لقی دووهەم

**ئەم لقە دوو نهێنیی ئەوتۆ ڕوون دەکاتەوە کە کلیلی گەلێ ڕاز و نهێنیی زۆریان تێدایە.**

**❐ نهێنیی یەکەم:**

بۆچی زۆرجار کەشف و شهوودی ئەولیاکان لە یەك ناچن، هەرچەندەش ئەوان لە بناغەکانی ئیمان"دا یەکیان گرتووە، ئەوەتا هەندێ جار کەشفەکانیان کە لە پلەی شهوود"یشدان، پێچەوانەی واقیع دەردەکەون؟!

بۆچی کەسانی خاوەن فیکر و نەزەر لە بیر و بۆچوونەکانیاندا بە پێچەوانەی یەکتر حەقیقەت" دەبینن و ڕوونی دەکەنەوە، لە کاتێکدا کە هەموو یەکێك لەوان، بە بەڵگەی

گومان‌بڕ حـەق‌بوونی "حەقیقـەت" دەچەسـپێنن؟ بۆچـی وا "حەقیقـەت" چـەند ڕەنگێکـی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت؟

❏ **نهێنیی دووهەم:**

بۆچی پێغەمبەرانی پێشین - درووودیان لەسەر بێت - هەندێك لە پایـەكانی ئیمانیـان، وەك حەشری جیسمانی، تا ڕادەیەك بە کورتی باس کردووە و بە وێنـەی قورئـانی پیرۆز بـە درێـژی لێی نەدواون، بە ڕادەیەك كە هەندێك لە نەتەوەكانی ئەوان - لە دوای خۆیان - ئینکاریی ئەو پایانەی ئیمانیان کردووە کە بە کورتی بۆیان باس کراوە؟

پاشـان بۆچـی بەشـێك لـە ئـەولیا خواناسـە ڕاستەقینەكان تەنـها لـە "تـەوحید"دا پێشکەوتوون و تەنانەت تیایشیدا گەیشـتوونەتە پلـەی "حق اليقين"، کـەچی هـەندێ پایـەی تری ئیمان، لە مەشرەبەكانی ئەواندا، بە کورتی دیارە یان بە دەگمەن دەبینرێت، تەنانەت هەر لەبەر ئەم هۆیە، لـە دوای خۆیـان، شـوێنکەوتووەكانیان بایـەخی پێویستیان بـەو پایانـەی تـری ئیمان نەداوە، بەڵکو هەندێکیشیان لە ڕێ ترازاون و گومڕا بوون؟!

خۆ مـادەم کـەماڵی ڕاستەقینە بـە دەرکـەوتنی "سـەرجەمی پایـەكانی ئیمـان" بەدەسـت دەهێنرێت، ئـەدی چـۆن "ئـەهلی حەقیقـەت" لـە هـەندێکیاندا پێش‌کـەوتن و لـە هـەندێکی تریشیاندا دواکەوتن؟ لە کاتێکدا پێغەمبـەری خۆشەویست ﷺ کە پێشـەوای پێغەمبەرانـە و، بەهرەمەندی پلە هەرە مەزنەكانی گشت ناوە جوانەكانی خوای گەورەیە.. هەروەها قورئـانی حەکیمیش کە پێشەوای هەموو کتێبە ئاسمانی‌یەكانە، هەردووکیان بـە ئاشـکرا و ڕوونـی و بـە شێوازێکی جیددی و ئامانجدار، درێژەیان بە ڕوونکردنەوەی سەرجەمی پایەكانی ئیمان داوە؟

**وەڵام:**

بەڵێ وایە، چونکە لە ڕاستی‌دا کەماڵی ڕاستەقینە و تەواوەتی بەو جۆرەیە!

حیکمەتی ئەم نهێنی‌یانەش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

"مرۆڤ" هەرچەندە توانای گەیشتنی بە سەرجەمی کەماڵات و بەدەسـتهێنانی نوورەكـانی هەموو ناوە جوانەكانی خوای گەورەی تێدایە، کەچی دەچـێ لـە نـاوەندی هـەزاران پـەردە و بەرزەخدا بە دوای "ڕاستی"دا دەگەڕێت، چونکە توانا و ئیختیاری ئەو هەندەكین و لێهاتن و ئارەزووەكانیشی جیاجیا و جۆراوجۆرن. لەبەر ئەمەیە کـە لـە دەمـی دەرکـەوتنی "ڕاسـتی" و بینینی "حەق"دا، پـەردە و بەرزەخـەكان دەکەونـە نێوانـەوە، هـەندێ کەسـیش نـاتوانێت لـە بەرزەخەكانەوە تێپەڕ ببێت.

ئنجا لەبەر ئەوەش کە توانا و لێهاتنـەكان لـە مرۆڤێکـەوە بـۆ مرۆڤێکـی تـر جیـاوازن، ئـەوا

توانا و لێهاتنی هەندێکیان لە دۆخێکی وەهادایە کە نابێ بە مایە و هۆی دەرکەوتنی هەندێ لە پایەکانی ئیمان.

پاشان بە گوێرەی جۆراوجۆریی بەدەستهێنانی: "شایستەیی لێ‌دەرکەوتنی ناوەکان" جۆرەکانی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەش جۆراوجۆر دەردەچن و، هەندێ لەو کەسانەی کە بە: شایستەیی لێ‌دەرکەوتنی یەکێك لەو ناوانە بەهرەمەند بووە، ناتوانێت ببێت بە مایەی لێ‌درەوشانەوەی تەواوەتیی ئەو ناوە. ئەمە جگە لەوەی کە درەوشانەوەی ناوەکانیش لە شتاندا، بە گوێرەی: (هەمەکێتی و، هەندەکێتی و، سێبەرایەتی و، ڕەسەنایەتیی درەوشانەوەکە) چەند شکڵ و شێوەیەکی دیاریکراو دەگرنە خۆیان و، توانا و لێهاتنی هەندێ کەس هێندە کۆتایە کە ناتوانێت "هەندەکێتی" ببڕێت و لە ژێر "سێبەر" دەربچێت. ئنجا هەندێ جار، بەپێی توانا و لێهاتنەکان، یەکێك لە ناوەکان بەسەر ئەو توانا و لێهاتنەدا زاڵ دەبێت و تەنها حوکمی خۆی جێ‌بەجێ دەکات.

وا ئەم نهێنی‌یە قووڵ و تەماوی‌یە و ئەم حیکمەتە فراوانە، بە چەند ئاماژەیەك لە نێوان "نموونە هێنانەوە"یەکی فراواندا، کە تا ڕادەیەك "حەقیقەت"ی ئاوێتە بووە، ئاماژەی بۆ دەکەین:

گریمان "گوڵ"ێکی نەخشین و، "دڵۆپ"ە ئاوێکی زیندووی شەیدای مانگ و، "نم"ێکی ساف و بێ‌گەردی ڕووبەڕووی خۆر هەبن، بە چەشنێ کە هەر یەکەیان خاوەنی هەست و نەست و، دارای کەماڵ بن و، شەوق و تاسەشیان بۆ ئەو کەماڵە تێدا بێت.

ئەم سێ شتە ئاماژە بۆ گەلێ ڕاستیی زۆر دەکەن، سەرەڕای ئاماژەکردنیشیان بۆ ڕێ بڕینی "نەفس" و "عەقڵ" و "ڕۆح". هەروەها نموونەن بۆ سێ توێژ و چینی ئەهلی حەقیقەت(1):

*چینی یەکەم:*

ئەهلی فیکر و، ئەهلی ویلایەت و، ئەهلی نبووەت.. کەواتە ئەم سێ شتانە ئاماژەن بۆ ئەوان.

*چینی دووهەم:*

ئەوانەن کە بە چەند ئامێرێکی جەستەیی (واتە لە ڕێی هەستەکانەوە) بەرەو "حەقیقەت" ڕێ دەبڕن تاکو بگەن بە کەماڵاتی خۆیان..

هەروەها ئەوانەن کە بە موجاهەدە کردن، لە ڕێی پاکژ کردنی نەفس و بەکارخستنی عەقڵ، بەرەو "حەقیقەت" هەنگاو دەنێن..

---

(١) لە هەموو توێژێکیشدا سێ تاقم هەن. کەواتە ئەو سێ نموونەیەی کە لە تەمسیلەکەدا هەن ڕوویان لە هەرسێ تاقمەکانی هەموو چینەکانە، تەنانەت لە هەر نۆیان نەك تەنها سیان. (دانەر)

هەروەها ئەوانەش کە بەهۆی خاوێن کردنەوەی دڵ و، ئیمان و، ملکەچی‌یەوە، بەرەو "حەقیقەت" دەڕۆن.

جا ئەم سێ شتانە، ئاماژەن بۆ ئەو سێ تاقمەش.

*چینی سێ‌هەم:*

ئەوانەن کە بۆ گەیشتن بە "حەقیقەت" تەنها ڕێی "بەڵگەهێنانەوە"یان گرتووەتە بەر و. وازیان لە "خۆپەرستی" و "غروور" نەهێناوە و، لە ئاسەوارەکانیشدا گەلێ ڕۆچوون..

هەروەها ئەوانەن کە لە ڕێی "زانست" و "دانست" و "مەعریفەت"ەوە بە شوێن "حەقیقەت"دا دەگەڕێن..

هەروەها ئەوانەن کە بە هۆی "ئیمان" و "قورئان" و لە ڕێی "هەژاری و بەندایەتی‌یەوە زۆر بە خێرایی دەگەنە "حەقیقەت".

جا ئەو سێ شتانە، چەند تەمسیل و نموونەهێنانەوەیەکن ئاماژە بۆ حیکمەتی جیاوازی و جۆراوجۆریی توانا و لێهاتنەکانی ئەو سێ تاقمەش دەکەن.

وا هەوڵ دەدەین لە ناوەندی نموونەیەکدا و لە ژێر ناونیشانی: "گوڵ" و "دڵۆپ" و "نم"دا. ئەو نهێنی‌یە ورد و حیکمەتە فراوانە ڕوون بکەینەوە کە لە بەرزبوونەوەی ئەم سێ چینەدا هەن:

"خۆر"، بە فەرمان و ڕوخسەتی بەدیهێنەرەکەی، سێ جۆری جیاجیای دەرکەوتن و ڕەنگدانەوە و، ڕووناکی‌بەخشینی هەیە.

یەکێکیان: لە سەر گوڵەکان.

یەکێکی تریان: لە سەر مانگ و هەسارە گەڕۆکەکان.

ئەوی تریان: لە سەر مادده بریسکەدارەکانی وەك شووشە و ئاو.

**یەکەمین** درەوشانەوەی خۆر، دەرکەوتنیەتی بە سێ شێوە:

شێوەی یەکەم: دەرکەوتنێکی "هەمەکی" و ڕەنگدانەوەیەکی گشتی‌یە، کە بریتی‌یە لە بەخشینی ئەو ڕووناکی‌یە بە سەرتاسەری "هەموو گوڵەکان".

شێوەی دووهەم: دەرکەوتنێکی "تایبەتی"یە، کە بریتی‌یە لە ڕەنگدانەوەیەکی تایبەتی بەپێی توانای هەموو یەکێك لە "جۆرەکانی گوڵ".

شێوەی سێ‌هەم: دەرکەوتنێکی "جوزئی"یە، کە ڕووناکی‌بەخشینیەتی بەپێی کەسایەتیی یەك بە یەکی هەموو "گوڵێك".

دەبێ ئەوەش یاد بخەینەوە کە ئەم نموونەیەمان لەسەر ئەو ڕا و بۆچوونە بنیات نراوە کە پێی وایە: ڕەنگە نەخشینەکانی گوڵ، لە ڕووناکی‌دانەوەی توانەوە و شیتەڵ بوونی حەوت

ڕەنگەکانی شەبەنگی خۆرەوە پەیدا دەبن. جا بەپێی ئەم ڕا و بۆچوونە، گوڵەکانیش جۆرە ئاوێنەیەکی خۆرن.

**دووهەمین** درەوشانەوەی خۆر بریتی‌یە لەو ڕێژنەی نوور و ڕووناکی‌یەی کە خۆر - بە ئیزنی بەدیهێنەری دانا - لە مانگ و هەسارە گەڕۆکەکانی‌دا دەیداتەوە.

کەواتە "مانگ" دوای ئەوەی ئەم ڕێژنە هەمەکی و نووورە فراوانەی بەسەردا دەڕێژرێت، سوودێکی "هەمەکی" لەو ڕووناکی‌یە وەردەگرێت کە لە حوکمی سێبەرێکدایە بۆ ڕووناکیی خۆر و..

پاشان بە شێوەیەکی "تایبەتی" لەم ڕووناکی‌یەی کە پێی بەهرەمەند بوو، دەدات بە دەریاکان و، هەوا و، گڵی بریسکەدار.

ئنجا بە شێوەیەکی "هەندەکی"ش بەسەر بلقەکانی ئاو و، وردیلەکانی گڵ و، گەردیلەکانی هەوادا پەخشیان دەکات.

**سێ‌هەمین** درەوشانەوەی خۆر بریتی‌یە لەو ڕووناکی‌دانەوە ساف و "هەمەکی" و "بێ سێبەر"ەی خۆر کە هەریەك لە: هەوای نێوان ئاسمان و زەوی و، ڕووی دەریاکان، دەکات بە ئاوێنەی خۆی..

پاشان ئەو خۆرە، "وێنە جوزئی"یەکەی و "پەیکەرە بچووککراوە"کەی خۆی دەدات بە هەموو یەکێك لە: بلق و دڵۆپەکانی دەریاکان و، دڵۆپەکانی ئاو و، نمەکانی هەوا و، کلووەکانی بەفر.

بەم جۆرە بینیمان کە "خۆر" لەو سێ ڕووە ناوبراوانەوە، ڕێژنە و ڕووتێکردنی خۆی ئاراستەی هەموو گوڵێك و، گشت دڵۆپە ئاوێکی ڕووبەڕووی خۆر و، هەموو نمێك دەکات، بە دوو ڕێگە لە هەریەکەیاندا..

ڕێی یەکەم: ڕووناکی‌بەخشینی ڕاستەوخۆ، بێ ئەوەی ئەو ڕووناکی‌یە بە ناو بەرزەخ و پەردەکاندا تێپەڕ ببێت.. ئەم ڕێ‌یە ڕێگای "نبووەت" دەنوێنێت.

ڕێی دووهەم: بەرزەخەکانی ئاوێتە دەبێ، چونکە قابیلییەتی ئاوێنە و شتە ڕووناکی دەرخەرەکان هەریەکەیان ڕەنگێك بەسەر درەوشانەوەی خۆردا دەدەن.. ئەم ڕێ‌یە ڕێگای "ویلایەت" دەنوێنێت.

بەم جۆرە، هەریەك لە "گوڵ" و "دڵۆپ" و "نم" لە ڕێی یەکەمدا دەتوانێت بڵێت: "من ئاوێنەی خۆری سەرانسەری جیهانم" بەڵام ناتوانێت لە ڕێی دووهەمدا ئەمە بڵێت، بەڵکو دەڵێت: "من ئاوێنەی خۆرەکەی خۆمم" یان "من ئاوێنەی ئەو خۆرەم کە بەسەر جۆر و هاوڕەگەزەکەمدا درەوشاوەتەوە". لەبەر ئەوەی لەم ڕێ‌یەدا ئەو بەم شێوەیە خۆر

دەناسێت و، ناتوانێت ئەو خۆرە ببینێت کە ڕووی لە سەرانسەری جیهانە..

چونکە خۆری ئەو کەسە، یان ئەو جۆرە، یان ئەو ڕەگەزە، لە ناوەندی بەرزەخێکی تەسك و پابەندی‌یەکی دیاری‌کراودا لێی دەردەکەوێت. دیارە ئەو "خۆرە پابەندە" ناتوانێت ئاسەواری "خۆری ڕەها"ی بێ پابەندی و بێ بەرزەخ ببەخشێت. واتە ناتوانێت بە بینینی "دڵ" گەرمی و ڕووناکی بە سەرتاسەری ڕووی زەوی ببەخشێت و، ژیانی سەرجەمی زیندەوەران و ڕووەکەکان بخاتە گەڕ و، هەسارەکانیش بە دەوری خۆی‌دا بخولێنێتەوە و، ئاسەوارە مەزنە شکۆدارەکانی وەك ئەمانە ئەنجام بدات.

بەڵێ، هیچ کام لەو سیانەی کە بە گریمان وامان دانا خاوەن هەست و شعوور بن، ناتوانن - لەم ڕێی دووهەمەدا - ئەو ئاسەوارانە بەو خۆرە ببەخشن کە لە ناو پابەندی‌یە تەسك و بەرزەخە سنووردارەکەدا بینی‌یان. خۆ ئەگەر ئەوان ئەو ئاسەوارە سەرسووڕهێنەرانەی کە لە ژێر ئەو پابەندی‌یەوە دەیبینن بە خۆری ڕەهای ببەخشن، ئەوا تەنها لە ڕوویەکی عەقلی و ئیمانیی ڕووتەوە - نەك بە شهوودی دڵ - دەیبەخشن پێی و، بە تەسلیم‌بوونێکی تەواو بەوەی کە پێیان وا دەبێ ئەو خۆرە پابەندە خودی خۆرە ڕەهاکەیە!

جا گێڕانەوەی ئەم حوکمانە (واتە ئەم ئاسەوارە مەزنانە) لە لایەن ئەو "گوڵ" و "دڵۆپ"و "نم"ەی کە بە گریمان وەك مرۆڤی ژێر دامان نان، بۆ خۆرەکانیان، گێڕانەوەیەکی "عەقلی"یە نەك "شهوودی"، تەنانەت هەندێ جار "بڕیارە ئیمانی‌یەکانیان" لەگەڵ "بینراوە گەردوونی‌یەکانیان"دا پێچەوانەی یەك دەردەچن و، گەلێ بە سەختی تەصدیقیان دەکەن.

* * *

دەبا ئێمە هەرسێکمان بۆ خۆشمان بڕۆینە ناو ئەم تەمسیلەی کە ئاوێتەی حەقیقەتە و هێندەش تەسکە جێی حەقیقەتی تێدا نابێتەوە، بەڵام لە هەندێ شوێنی‌دا لاکانی حەقیقەت دەبینرێن و دەردەکەون.

گریمان ئێمە هەرسێکمان ئەو "گوڵ" و "دڵۆپ" و "نم"ەین، چونکە ئەو هەست و شعوورەی کە بە گریمان دامان نا تیایاندا ببێت، بەشی ئەم کارە ناکات. بۆیە وا ژێریی خۆیشمان دەنێرینە ناویانەوە. واتە دەبێ تێ‌بگەین لەوەی کە: هەروەك ئەو سیانە لە ڕێژنەی ڕووناکیی خۆرە ماددی‌یەکەیان بەهرەمەند دەبن، ئێمەش بە هەمان جۆر لە هی خۆرە مەعنەوی‌یەکەمان بەهرەمەند دەبین..

دەسا ئەی ئەو هاوڕێیەی کە دنیا لە بیر ناباتەوە و لە شتانی ماددی‌دا ڕۆدەچێت و نەفسیشی چڕ و ئەستوور بووە! تۆ ببە بە "گوڵ"ەکە، چونکە توانا و لێهاتنت وەك هی ئەو

وێیە، ئەوەتا ئەو گوڵە لە ئاوێتەبوونی ڕووناکیی خۆرەوە ڕەنگێك وەردەگرێت و وێنەی نموونەی خۆر لەو ڕەنگەدا ئاوێتە دەكات و لە شێوەیەكی جواندا خۆی پێ دەنەخشێنێت.

ئنجا ئەم فەیلەسووفەش كە لە قوتابخانە نوێیەكاندا خوێندوویەتی و، باوەڕی بە كاریگەریی "هۆكارەكان" هەیە و، لە "سەعیدی كۆن" دەچێت، با ببێت بە "دڵۆپ"ە شەیداكەی ئەو مانگەی كە سێبەری "ڕووناكی"ی لە خۆر وەرگیراوی دەداتێ و، ڕووناكییەك بە چاوی ئەو دەبەخشێت كە پێی بتریسكێتەوە.. بەڵام ئەو دڵۆپە دەبێ بزانێت كە جگە لە "مانگ" چیی تر بەو ڕووناكییە نابینێت و ناتوانێت "خۆر"ی پێ ببینێت. مەگەر بە ڕێی ئیمانەكەیەوە – نەك بەو ڕووناكییە – بتوانێت خۆر ببینێت.

پاشان ئەم هەژارەش (دانەر مەبەستی خۆیەتی) كە باوەڕی وایە هەموو شتێك ڕاستەوخۆ لە خوای گەورەوەیە و "هۆكارەكان" بە پەردە دادەنێت، با "نم"ەكە بێت. ئەوەتا لە خۆیدا نمێكی هەژارە و شتێكی ئەوتۆی نییە وەك گوڵەكە پشتی پێ ببەستێت و پاڵی پێوە بدات و، ڕەنگێكیشی نییە كە بەهۆیەوە ببینرێت و، جگە لە خۆر هیچ شتێكی تر ناناسێت تا ڕووی تێ بكات، هێندە نەبێت كە سافی و خاوێنییەكی بێ گەردی ئەوتۆ لە بیلبیلەی چاویدا شك دەبات كە وێنەی خۆری پێ هەڵبگرێت.

ئێستاش مادەم ئێمە ڕۆشتینە شوێنەكانی ئەم سیانە، با سەیری خۆمان بكەین و بزانین چیمان تێدایە و خەریكی چیین؟ ئەوەتا كە سەیر دەكەین دەبینین : "بەخشندەی میهرەبان" چ كەكاری و نیعمەتەكانی خۆیمان بەسەردا دەبارێنێت و، ڕووناكیمان دەداتێ و، پەروەردەمان دەكات و، دەمانڕازێنێتەوە. خۆ مرۆڤیش دیل و بەندەی چاكەیە و دەیەوێ لەو كەسە نزیك ببێتەوە و ببینێت كە شایانی پەرستن و خۆشەویستییە.

لەبەر ئەوە، وا هەریەك لە ئێمە بە هاندەری كێش(جاذبـة)ی ئەو خۆشەویستییە بەپێی توانا و لێهاتنی خۆی، ڕێگا دەبڕێت بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی.

دەسا ئەی ئەو كەسەی كە وەك "گوڵ" وایە! تۆ ڕێی خۆت بگرە بەر، بەڵام لە یادت نەچێت كە دەبێ وەك گوڵێك بەو ڕێیەدا بڕۆیت .. ئەوا ڕۆیشتیت و، پلە لە دوای پلە بەرزبوویتەوە تاكو گەیشتیتە پلەیەكی "هەمەكیی" ئەوتۆ دەڵێی لە جێی هەموو گوڵەكاندایت. بەڵام خۆ "گوڵ" ئاوێنەیەكی چرە و، حەوت ڕەنگەكانی ڕووناكیی خۆری تێدا دەشكێنەوە و شیتەڵ دەبن و وێنەكەی خۆر لەناو خۆیدا دەشارێتەوە. لەبەر ئەوە، لە بینینی ڕووی خۆرە خۆشەویستەكەتدا سەركەوتن بەدەست ناهێنیت، چونكە ڕەنگە بەندەكان و تایبەتكارییەكانی گوڵ، ڕووناكیی خۆر لە تۆدا پەرش و بڵاو دەكەنەوە و پەردە لە ڕووی ئەو ڕووناكییەدا دەگێڕن و پشتی پەردەكە دادەپۆشن. تۆ لەم حاڵەدا لە

دەست ئەو جوداییيانەی كە ئەنجامی تێكەڵ بوونی وێنە و بەرزەخەكانن، ڕزگارت نابێت مەگەر بە یەك مەرج، كە بریتییە لەوەی:

سەری نوقم بووی ناو "خۆشەویستیی خۆت" بەرز بكەیتەوە و، واز بهێنیت لەوەی كە بە چێژ و ڕازی بوونەوە بۆ چاكەكارییەكانی خۆت بڕوانیت و، لەخۆباییبوون و غرور پشتگوێ بخەیت و، ڕوانینت تەنها ئاراستەی ڕووی خۆری ناو جەرگەی ئاسمان بكەیت و. پاشان ئەو ڕووەی كە بۆ "خاك" نەویت كردووە و داوای ڕۆزیی پێ دەكەیت، ڕووەو "خۆر وەری بچەرخێنیت كە لەو بەرزاییەدایە. چونكە تۆ ئاوێنەی خۆریت و ئەركی سەرشانیشت بریتییە لە ئاوێنەبوون بۆ خۆر و دەرخستنی درەوشانەوەكانی خۆر. دڵنیاش بە كە ڕۆزییەكەت لە دەرگای گەنجینەی میهرەبانییەوە(خاك) هەر پێ دەگات، چ بە خۆت بزانیت یان نەزانیت.

بەڵێ، هەروەك "گوڵ" ئاوێنەیەكی بچووكی خۆرە، ئەم خۆرە زەبەلاحەش ئاوێنەیە و وەك دڵۆپێكی دەریای ئاسمان وایە؛ بریسكانەوەیەكی درەوشانەوەی ناوی جوانی "النور"ی خوای گەورە دەداتەوە. دەسا ئەی دڵی مرۆڤ! بزانە ئەو خۆرە چەندە مەزنە كە تۆ ئاوێنەی ئەویت!

دوای ئەوەی كە ئەم مەرجەت ئەنجام دا، بە "كەماڵ"ی خۆت دەگەیت. بەڵام هێشتا هەر خودی خۆر بە ڕاستی لە خۆیدا نابینیت، بەڵكو هەرگیز پەی بەو ڕاستییە موجەڕڕەدە نابەیت، چونكە ڕەنگاوڕەنگیی سیفەتەكانت ڕەنگێكی پێ دەدات و، چاویلكە چڕ و پڕەكەشت شێوەیەكی لەبەر دەكات و، توانا و لێهاتنە پابەندەكانیشت لە سنووری پابەندیدا دەیهێڵێتەوە.

ئێستاش ئەی ئەو فەیلەسووفە حەكیمەی كە ڕۆشتووەتە ناو "دڵۆپ"ەكەوە! وا تۆ بە چاویلكەی "دڵۆپ"ی بیری خۆت و پلیكانەی فەلسەفە بەرز بوویتەوە تاكو گەیشتیتە "مانگ" و ڕۆیشتیتە ناوی.

بڕوانە! ئەوەتا "مانگ" لە زاتی خۆیدا شتێكی چڕە و نە ڕووناكیی هەیە و نە ژیانیشی تێدایە. كەواتە هەوڵت بێهوودە و زانیارییەكەشت بێسوود و ئەنجام دەرچوون. بەڵام گەر ئەم مەرجانەی خوارەوە ئەنجام بدەیت، لە تاریكایی نائومێدی و، دڵتەنگیی غەریبی و، بێزار كردنی ڕۆحیانەتە چەپەڵەكان ڕزگار دەبیت. مەرجەكانیش ئەمانەن:

گەر واز لە شەوگاری "سروشت" بهێنیت و.. ڕوو لە خۆری "حەقیقەت" بكەیت و.. بە دڵنیاییيەوە باوەڕ بهێنیت بەوەی كە ڕووناكییەكانی ئەم شەوگارە تەنها سێبەری ڕووناكییەكانی خۆری ڕۆژگارن. ئەوا بەم سێ مەرجە "كەماڵ"ی خۆت بەدەست

دەهێنیت و، لە بریی "مانگ"ێکی هەژار و تاریك، خۆری ڕووناکی بەسام و شکۆت دەست دەکەوێت. بەڵام هەر هێشتا تۆش - وەك هاوەڵەکەی ترت - بە ڕوونی و خاوێنی و سافی "خۆر" نابینیت، بەڵکو لە پشتی ئەو پەردانەوە دەیبینیت کە ژیری و فەلسەفەکەت لەگەڵیاندا ڕاهاتوون و، لەودیوی ئەو بەربەستانەوە پەیی پێدەبەیت کە زانست و حیکمەتەکەت بۆیان چنیویت و، لە ڕەنگ و شێوەیەکدا دەیبینیت کە توانا و لێهاتنت بە بەری خۆریان بڕیوە.

وا هاوەڵی سێهەمیشتان، کە وەك "نم" وایە، هەژارە.. بێ ڕەنگە.. هەر خێرا بەهۆی گەرمیی خۆرەوە دەبێت بە هەڵم و، واز لە خۆویستیی خۆی دەهێنێت و، سواری پشتی هەڵم دەبێت و، بە بۆشایی نێوان ئاسمان و زەویدا سەر دەکەوێت و، بە ئاگری عیشق ماددە چرەکەی ناوی گڕ دەگرێت و، لە ڕێی ڕووناکیيەوە دەبێت بە "نوور" و، دەست بە یەکێك لەو تیشکانەوە دەگرێت کە لە درەوشانەوەکانی ئەو ڕووناکیيەوە هاتوون و، بۆ خۆی لەم ڕێیەوە لێی نزیك دەبێتەوە!

دەسا ئەی وێنە و نموونەی "نم"ەکە! تۆ مادەم ڕاستەوخۆ ئەرکی ئاوێنە ڕادەپەڕێنیت بۆ "خۆر"، ئەوا لە هەر پلەیەکدا دەبیت بە، چونکە دەتوانیت لەو پلەیەدا پەنجەرەیەکی ڕوون و خاوێنت دەست بکەوێت کە بە "عین الیقین" سەیری ڕووی خۆری لێوە بکەیت و، لە گێڕانەوەی ئاسەوارە سەرسووڕهێنەرەکاندا بۆ خۆر، گرفتاری هیچ چەشنە دژواری و گیروگرفتێك نەبیت. چونکە دەتوانیت - بێ هیچ چەشنە دوودڵیيەك - وەسفە بەهەیبەت و سامەکانی خۆر بۆ خودی خۆر بگێڕیتەوە و، هیچ شتێك ناتوانێت ڕێی گێڕانەوەی ئەو ئاسەوارە سەرسووڕهێنەرانەت بۆ دەستەڵاتداریيە ڕەهاکەی خۆر لێ بگرێت.. نە تەنگ و تاریی بەرزەخەکان، نە پابەندیی توانا و لێهاتنەکان.. نە بچووکیی ئاوێنەکان، هیچ کامیان گرفتاری سەرسامیت ناکەن و بەرەو شتێکی پێچەوانەی "حەقیقەت" ناتبەن، چونکە خۆت ساف و بێگەردیت و ڕاستەوخۆ سەیری خۆر دەکەیت. هەر لەبەر ئەوەیە کە زانیت ئەوەی لە ئاوێنەکاندا دیارن خودی خۆر نین، بەڵکو جۆرە درەوشانەوە و ڕەنگدانەوەیەکی جۆراوجۆرن و، تەنها بەڵگە و ناونیشانی خۆرن و، ناتوانن سەرجەمی ئاسەوارە بەسام و شکۆدارەکانی خۆر دەربخەن.

* * *

لەم نموونەیەدا، کە ئاوێتەی حەقیقەتە، لە سێ ڕێگای جیاجیا و جۆراوجۆرەوە ڕێی "حەقیقەت" دەگیرێتە بەر. ئەوانەش کە ئەم سێ ڕێگایانە دەگرنەبەر، لە تایبەتکارییەکانی کەماڵات و درێژەی پلەی بینیندا جیاجیا دەبن، هەرچەندەش لە: ئەنجام و، ملکەچ کردندا بۆ

حەق و تەسدیق کردنی حەقیقەتدا، هەموویان یەك دەگرنەوە.

جا هەروەك ئەگەر مرۆڤێك هەر تەنها شەوی بینیبێت و هەرگیز چاوی بە "خۆر" نەکەوتبێت، بەڵکو تەنها لە ئاوێنەی مانگدا سێبەرەکانی خۆری دیبێت، ناتوانێت سادە و هەیبەتی ڕووناکیی تایبەتیی و جاذیبەی مەزنی خۆر لە ژێریی خۆیدا جێ بکاتەوە، بەڵکو بە تەقلید کردنی ئەو کەسانەی دیویانە تەسلیم و ملکەچ دەبێت..

هەروەك ئەو کەسە وایە، بە هەمان جۆر، ئەو کەسەش کە ڕێی میراتگریی پێغەمبەر ﷺ (وراثة النبوة)ی نەگرتووەتەبەر و لەو ڕێیەوە نەگەیشتووەتە پلەی هەرە بەرز و مەزنی دوو ناوی: "القدير" و "المحيي" و ناوە جوانە هاوچەشنەکانیان، کە بە گرتنەبەری ئەو ڕێیە مرۆڤ پێیان بەهرەمەند دەبێت.. ئەو کەسە تەنها بە چاولێکەریی کەسانی تر حەشر و قیامەتی هەرە مەزن دەبینێت و قبوولی دەکات و، دەڵێت: (ئەم کێشەیە کێشەیەکی عەقڵی نییە). چونکە ڕاستیی حەشر و قیامەت مەزهەر و ئاوێنەی تیادەرکەوتنی ئیسمی ئەعزەم و پلە هەرەمەزنەکانی هەندێکی تری ناوە جوانەکانی خوای گەورەن.

دیارە ئەو کەسەی کە بینینی نەگەیشتبێتە ئەو پلەیە و تا ئەوێ بەرز نەبووبێتەوە، ناچاری "چاولێکەری" دەبێت. بەڵام ئەو کەسەی بیری گەیشتبێتە ئەوێ، بە وێنەی ئاسانیی ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژ، حەشر و قیامەتیشی پێ ئاسان دەبێت و بە بێ تەقلید و بە دڵێکی ئارام و دڵنیاوە، باوەڕی پێی دەبێت.

لەم نهێنییەوەیە کە قورئانی پیرۆز حەشر و قیامەت لە گەورەترین پلە و تەواوترین ڕوونکردنەوەدا، باس دەکات و، پێغەمبەری مەزنیش ﷺ کە بەهرەمەندی نوورەکانی ئیسمی ئەعزەم بووە، بە هەمان جۆر خەڵکی بۆ ڕێنمایی دەکات.

* * *

سەبارەت بە پێغەمبەرانی پێشینیشەوە - درووردیان لەسەر بێت - کە مەسەلەی حەشریان لە مەزنترین پلە و فراوانترین درێژەپێداندا ڕوون نەکردووەتەوە و، بە کورتی و پوختی لێی دواون، هی ئەوەیە کە نەتەوەکانیان لەو سەردەمانەدا لە حاڵەتە سەرەتایی و سادەکانی ژیاندا بوون، بۆیە حیکمەتی ئیرشاد داخوازی ئەو پوختە لێدوانە بووە.

هەر لەم نهێنییەوەیە کە: هەندێ لە ئەولیاکان بەشێکی پایەکانی ئیمانیان لە پلە هەرە مەزنەکەیدا نەبینیوە، یان نەیانتوانیوە بەو جۆرە و لەو پلەیەدا ڕوونی بکەنەوە.

هەر لەم نهێنییەشەوەیە کە پلەکانی خواناسان لە ناسینی خوای گەورەدا جیاجیا و جۆراوجۆر دەردەچێت..

بەم جۆرە، لەم ڕاستییەوە، گەلێ نهێنیی زۆری وەك ئەمانە دەردەکەون.

وا ئێستا کۆتایی بەم نموونەهێنانەوەیە دێنین، کە تا ڕادەیەك "حەقیقەت" دەردەخات، چونکە خودی حەقیقەت گەلێ قووڵ و فراوانە و، ئێمەش دەست لەو نهێنییانە وەرنادەین کە لە سنووری ئێمە بەدەرن و زۆر لە سەرووی توانای خۆشمانەوەن.

# لقی سێهەم

لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە جۆرێکی تا ڕادەیەك تەماوی لە بەشێکی ئەو فەرموودە پیرۆزانە دەگات کە لە "نیشانە و ڕووداوەکانی قیامەت" و "چاکی و پاداشتی کردەوەکان" دەدوێن و، واتاکانیان لە بەرچاوی زەینیدا بە ڕوونی دەرناکەون، ئەوا چەند کەسێکی ئەهلی عیلم لەوانەی بە ژیریی خۆیان دەنازن ئەو ڕیوایەتانەیان بە "ضعیف" لە قەڵەم داوە و هەندێکیشیان لە ڕیزی "موضوعات"دا داناوە.. کەسانێکی تریش لەوانەی کە ئیمانیان لاوازە و بە ژیریی خۆیان بایی بوون، پتر زیادە ڕەوییان نواندووە و، ئینکاریی ئەو فەرموودە پیرۆزانەیان کردووە!

ئێمە نامانەوێت لێرەدا بە دوور و درێژی لەگەڵیان بدوێین، بەڵکو خوێنەر بۆ "دوازدە" دەستوور و ئوسووڵی گشتی بێدار دەکەینەوە لەوانەی کە دەکرێت بۆ مەبەستی تێگەیشتن ئەم فەرموودە پیرۆزانە سوودیان لێ وەربگیرێت.

☐ **دەستووری یەکەم:**

ئەم دەستوورە بریتییە لەو مەسەلەیەی کە لە وەڵامی پرسیارەکەی کۆتایی وتەی بیستەمدا ڕوونمان کردەوە، کە ئەمەی خوارەوە پوختەکەیەتی:

"ئایین" تاقیکردنەوە و ئیمتیحانە، ڕۆحیانەتە بەرزەکان لە ڕۆحیانەتە نزمەکان جیا دەکاتەوە! لەبەر ئەوە، سەبارەت بەو ڕووداوانەی کە لە ئایندەدا خەڵکی دەیانبینن، بە شێوازێك دەدوێت کە هێندە تەماوی نەبێت کەس لێیان تێنەگات و هێندەش ڕوون نەبێت کە بە وێنەی شتانی بەڵگەنەویست خەڵکی ناچاری تەصدیق کردنی ببن. بەڵکو بە کراوەیی دەیانخاتە پێش چاوی ژیرییەکان، نە هێندە تەماوی و نادیارن کە لە بەرامبەریانەوە دەستەوسان بن، نە هێندەش ڕوونن کە توانای ئیختیاریان لێ داماڵێت!

خۆ ئەگەر بە وێنەی ڕوونیی شتانی بەڵگەنەویست یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت دەربکەوتایە و خەڵکی ناچاری تەسدیق کردنی ببوونایە، ئەوا ئەو کاتە توانا و لێهاتنێکی سروشتیی بێنرخی وەك خەڵووز لەگەڵ یەکێکی تری بەنرخی وەك ئەڵماسدا یەکسان

ده‌بوون. دیاره له كاتێكی وه‌هاشدا نه‌هێنیی "ته‌كلیف" و ئه‌نجامی تاقیكردنه‌وه‌كه زایه ده‌بوون و به خۆڕایی له ده‌ست ده‌رده‌چوون!

له‌به‌ر ئه‌وه، چه‌ندین مه‌سه‌له‌ی زۆر هه‌یه كه گه‌لێ ئیختیلافیان تێدا په‌یدا بووه، وه‌كو مه‌سه‌له‌كانی مه‌هدی[1] و سوفیانی[2]. ئنجا له‌به‌ر زۆریی ئیختیلافی ڕیوایه‌ته‌كانیش چه‌ندین حوكمی زۆر و پێچه‌وانه‌ی یه‌كتر سه‌باره‌ت به فه‌رمووده‌كان ده‌ركراون.

❑ ده‌ستووری دووهه‌م:

مه‌سه‌له و بابه‌ته ئیسلامی‌یه‌كان چه‌ند پله و توێژێكن، جا له‌كاتێكدا كه هی وایان تێدایه - وه‌كو باسه‌كانی عه‌قیده - پێویستی به به‌ڵگه‌ی گومانبڕی قه‌تعی هه‌یه، پله‌ی واشیان هه‌یه كه ته‌نها "ظه‌ننی غالیب"ی سه‌روزیاده و، هه‌ندێكی تریشیان ته‌نها پێویستی به ته‌سلیم بوون و قبووڵ كردن و ڕه‌ت‌نه‌دانه‌وه هه‌یه.

له‌به‌ر ئه‌وه، بۆ مه‌سه‌له و بابه‌ته فه‌رعی‌یه‌كان و ڕووداوه‌كان، كه له بناغه‌كانی ئیمان نین، داوای به‌ڵگه‌ی قه‌تعی و ملكه‌چ بوونی یه‌قین ناكرێت، به‌ڵكو ته‌سلیم بوون و ڕه‌ت‌نه‌دانه‌وه‌یان سه‌روزیاده.

❑ ده‌ستووری سێ‌هه‌م:

له سه‌رده‌می هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌كاندا - خوایان لێ ڕازی بێت - گه‌لێ زانای "به‌نی ئیسرائیل" و "فه‌له"(گاور) موسڵمان بوون و، زانیاری‌یه‌كانی پێشوویان له‌گه‌ڵ خۆیاندا

---

(١) أحاديث المهدي عند الترمذي، وأبي داود، وابن ماجه، والحاكم، والطبراني، وأبي يعلي الموصلي، وأسندوها إلى جماعة من الصحابة. قال الشوكاني في التوضيح: والأحاديث الواردة في المهدي التي أمكن الوقوف عليه منها خمسون حديثاً فيها الصحيح والحسن والضعيف المنجبر، وهي متواترة بلا شك ولا شبهة، بل يصدق وصف التواتر على ما هو دونها على جميع الاصطلاحات المحررة في الأصول، وأما الآثار عن الصحابة المصرحة بالمهدي فهي كثيرة ايضاً، لها حكم الرفع، إذ لا مجال للاجتهاد في مثل ذلك إهـ (الاذاعة لمحمد صديق حسن خان: ١١٣ - ١١٤) وانظر التحفة للمباركفوري (٤٨٥/٦). (وه‌رگێڕ - له چاپه عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌وه هێناویه‌تی)

(٢) وردت احاديث كثيرة بحق دجال المسلمين الموصوف "بالسفياني" نذكر منها:
"عن ابي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: يخرج رجل يقال له السفياني في عمق دمشق وعامة من يتبعه من كلب، فيقتل حتى يقر بطون النساء ويقتل الصبيان فتجمع لهم قيس فيقتلها حتى لا يمنع ذنب تلعة. ويخرج رجل من أهل بيتي في الحرة فيبلغ السفياني، فيبعث اليه جنداً من جنده فيهزمهم فيسير منهم اليه السفياني بمن معه حتى إذا صار ببيداء من الارض خسف هم فلا ينجو منهم الاّ المخبر عنهم" اخرجه الحاكم في المستدرك ٥٢٠/٤ وقال: هذا حديث صحيح الاسناد على شرط الشيخين و لم يخرجاه، ووافقه الذهبي. (يبقر: يفتح - كلب: ماء بين الكوفة والشام - لا يمنع ذنب تلعة: لا يخلو منه موضع". وأورده السيوطي في اللآليء ٣٨٨/٢ والاسفراني ٧٥/٢ وانظر البداية والنهاية لابن كثير وتذكرة القرطبي. (وه‌رگێڕ - له چاپه عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌وه هێناویه‌تی)

هێنایە ناو ئیسلامەتی‌یەکەیانەوە. جا هەندێ لەو زانیاری‌یە پێشووانەی ئەوان کە پێچەوانەی واقیعی حاڵ بوون و ئەندازەکەشیان کەم نەبوو، بە وەهم و هەڵە، وەك بەشێك لە زانستە ئیسلامی‌یەکان تەماشا کراون و وەرگیراون!

**❑ دەستووری چوارەم:**

هەندێ لە وتەی ئەو کەسانەی کە فەرموودەکانیان ڕیوایەت کردووە یان هەندێ لەو واتایانەی کە ئەوان لەو فەرموودانەیان هەڵگۆزیوە، تێکەڵی دەقی فەرموودەکان بوون و پێکەوە بە یەك چاو تەماشا کراون. خۆ مادەم مرۆڤیش لە هەڵە بەدەر نی‌یە، ئەوا هەندێ لەو قسە و واتایانەی ئەوان پێچەوانەی واقیع دەرچوون، ئەمەش بووە بە مایەی لاوازبوونی فەرموودەکە.

**❑ دەستووری پێنجەم:**

هەندێ لەو واتایانەی کە بە ئیلهام خراونەتە دڵی ئەولیا و ئەهلی کەشفەوە، بە "فەرموودە" لە قەڵەم دراون، لەسەر ئەو بناغەیەی کە نەتەوەی ئیسلام کەسانی "مُحَـدَّث"[(١)] واتە ئیلهام‌کراویان تێدایە. ئاشکراشە کە هەندێ جار ئیلهامی ئەولیا، لەبەر چەند تەگەرەیەك، بە هەڵەدا دەچێت و دەگونجێ لەم چەشنە ڕیوایەتانەدا شتی پێچەوانەی ڕاستی دەربکەوێت.

**❑ دەستووری شەشەم:**

هەندێ حیکایەت لەناو خەڵکیدا ناوبانگ دەردەکەن و لە ناویاندا بە وێنەی "پەند" دەماودەمی پێ دەکرێت. دیارە "پەند"یش سەیری واتا ڕاستەقینەکەی ناکرێت، بەڵکو سەیری ئەو ئامانجە دەکرێت کە لە پێناویدا هێنراوە. لەبەر ئەوە، هەندێ فەرموودە، بۆ مەبەستی ڕێنمایی و ڕێ پیشاندان، هەندێ چیرۆك و حیکایەتیان لە قاڵبی کینایە و شێوازی تەمسیلدا باس کردووە، لەوانەی کە خەڵکی پێی ئاشنان و لەسەری ڕاهاتوون.

جا ئەگەر هەر ناتەواوی و کەموکوڕی‌یەك لە "واتا حەقیقی"یەکەی ئەم چەشنە مەسەلانەدا ببێت، ئەوا هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ عورف و عادەتی خەڵکی و ئەو حیکایاتانەی کە دەماودەم بیستوویانە و لەگەڵی ڕاهاتوون.

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: "لقد كان فيمن كان قبلكم من الأمم ناس محدَّثون من غير أن يكونوا أنبياء، فإن يكن من أمتي أحد فانه عمر" رواه البخاري في فضائل أصحاب النبي ﷺ، باب مناقب عمر بن الخطاب رضي الله عنه مسنداً ومعلقاً. وفي الأنبياء، باب ما ذكر عن بني إسرائيل. ورواه مسلم ٢٣٩٨ في فضائل الصحابة، باب فضائل عمر بن الخطاب رضي الله عنه من حديث عائشة رضي الله عنها. (وەرگێڕ –لە جیە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی).

❑ **ده‌ستووری حه‌وته‌م:**

گه‌لێ نموونه‌هێنانه‌وه‌ و ته‌شبیهی به‌لاغی هه‌ن، كه‌ چ به‌هۆی تێپه‌ڕبوونی كات و چ به‌هۆی ده‌رچوونیانه‌وه‌ له‌ ده‌ستی "زانین" بۆ ناو ده‌ستی "نه‌زانی"، به‌ وێنه‌ی چه‌ند ڕاستی‌یه‌كی ماددی وه‌رگیراون. بۆیه‌ ئه‌و خه‌ڵكانه‌ی كه‌ ته‌شبیهه‌كان به‌ حه‌قیقه‌تی ماددی داده‌نێن، به‌ هه‌ڵه‌دا ده‌چن.

بۆ نموونه‌: ئه‌و دوو مه‌لائیكه‌ته‌ی كه‌ ناویان "گا" و "نه‌هه‌نگ"ه‌ و له‌ جیهانی میسالیشدا له‌ شێوه‌ی گا و نه‌هه‌نگدان و، له‌ چینی ئه‌و مه‌لائیكه‌تانه‌ی خوای گه‌وره‌ن كه‌ سه‌رپه‌رشتیی زینده‌وه‌رانی وشكایی و ده‌ریای گۆی زه‌وی ده‌كه‌ن، له‌ گومان و بۆچوونی هه‌ڵه‌ی خه‌ڵكدا بوون به‌ گایه‌كی زه‌به‌لاح و نه‌هه‌نگێكی به‌رجه‌سته‌! كه‌ ئه‌مه‌ش بووه‌ به‌هۆی ڕه‌خنه‌گرتن له‌ فه‌رمووده‌كه‌.

نموونه‌یه‌كی تر: جارێكیان له‌ كۆڕی پێغه‌مبه‌ردا ﷺ ده‌نگێك بیسترا، پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: ئه‌مه‌ ده‌نگی به‌ردێكه‌ كه‌ حه‌فتا ساڵه‌ بۆ دۆزه‌خ هه‌ڵدراوه‌ و ئێستا گه‌یشته‌ بنكی دۆزه‌خ[1]. جا ئه‌و كه‌سه‌ی ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ ده‌بیستێت و حه‌قیقه‌ته‌كه‌ی بۆ ڕوون نه‌بووه‌ته‌وه‌، ئینكاریی ده‌كات و به‌مه‌ش له‌ ڕێ ده‌ترازێت. به‌ڵام گه‌ر بزانێت به‌ جۆرێكی بێ گومان چه‌سپاوه‌ كه‌ دوای ماوه‌یه‌كی كه‌م یه‌كێك هاته‌ خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و هه‌واڵی پێ دا كه‌ نه‌ختێك پێش ئێستا فلانه‌ موونافیقی به‌ناوبانگ مرد، ئه‌وا ئه‌و كاته‌ دڵنیا ده‌بێت كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌ ڕه‌وانبێژی‌یه‌ به‌رزه‌ پێغه‌مبه‌رانه‌كه‌ی خۆی وێنه‌ی ئه‌و موونافیقه‌ ته‌مه‌ن حه‌فتا ساڵه‌ی به‌ شێوه‌ی به‌ردێك كێشاوه‌ كه‌ بۆ بنكی دۆزه‌خ تلێر ببێته‌وه‌، چونكه‌ سه‌رجه‌می ژیانی ئه‌و موونافیقه‌ كه‌وتنه‌خواره‌وه‌ بووه‌ بۆ ناو كوفر و تلێربوونه‌وه‌ بووه‌ بۆ نزمترین پله‌ی نزمی. خوای گه‌وره‌ش له‌ ده‌می مردنی ئه‌و موونافیقه‌دا ئه‌و ده‌نگه‌ی به‌ گوێدا دان و كردی به‌ نیشانه‌یه‌ك له‌سه‌ر دوائه‌نجامی ئه‌و.

---

(١) روى مسلم في كتاب الزهد، وصفة الجنة، والإيمان، عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: "كنا مع رسول الله ﷺ إذ سمع وجبة (أي سقطة) فقال النبي ﷺ تدرون ما هذا؟ قلنا: الله ورسوله أعلم. قال: هذا حجر رمي به في النار منذ سبعين خريفاً فهو يهوي في النار الآن حتى انتهى إلى قعرها" زاد في رواية "فسمعتم وجبتها" (٤/٢١٨٥ - ٣١٨٥ رقم ٢٨٤٤).

وروى أيضاً عن جابر رضي الله عنه ان رسول الله ﷺ قدم من سفر، فلما كان قرب المدينة هاجت ريح شديدة تكاد ان تدفن الراكب، فزعم أنَّ رسول الله ﷺ قال: بعثت هذه الريح لموت منافق، فلما قدم المدينة فإذا منافق عظيم من المنافقين قد مات". (٤/٢١٤٥ رقم ٢٧٨٢). ورواه أحمد بغير هذا اللفظ (٣/٣٤١، ٣٤٦).
(وه‌رگێڕ – له‌ چاپه‌ عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌وه‌ هێناویه‌تی).

❑ **دەستووری هەشتەم:**

خواوەندی دانای زانا لەم خانەی ئیمتیحان و گۆڕەپانی تاقیکردنەوەیەدا هەندێ شتی گرنگ لە دووتوێی گەلێ کاروباری زۆردا دەشارێتەوە، چەندەها حیکمەت و بەرژەوەندیی زۆریش بەم شاردنەوەیەوە پەیوەست دەکات.

بۆ نموونە: خوای گەورە "شەوی قەدر"ی لە مانگی ڕەمەزاندا و، "سەعاتی دوعا گیرابوون"ی لە شەو و ڕۆژی جومعەدا و، "ئەولیا و پیاوچاکان"ی لە نێوان کۆمەڵانی مرۆڤدا و، "ئەجەل"ی لە تەمەندا و، "بەرپابوونی قیامەت"ی لە تەمەنی دنیادا... هتد، شاردووەتەوە..

خۆ ئەگەر ئەجەلی مرۆڤ دیار بووایە و کاتەکەی بزانرایە ئەوا ئەم مرۆڤە هەژارە نیوەی تەمەنی لە بێئاگاییەکی تەواوەتیدا بەسەر دەبرد و، نیوەکەی تریشی هێندە دەحەپەسا و گیرۆدەی سام و مەترسی دەبوو هەتا وەکو کەسێکی لێ دەهات کە هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پەتی سێدارە بڕوات. کەچی پارێزگاری کردنی هاوسەنگیی پێویست لە نێوان: دنیا و دوارۆژدا و، بەرژەوەندیی مانەوەی دڵی مرۆڤ لە نێوان: ترس و ئومێد(الخوف والرجاء)دا، داخوازی ئەوەن کە: هەموو خولەکێکی ژیانی مرۆڤ بگونجێ مردن یەخەی پێ بگرێت و بیشگونجێ ژیانی هەر بەردەوام بێت. بۆیە تەمەنێکی ئەجەل نەزانراوی بیست ساڵی لە تەمەنێکی ئەجەل زانراوی هەزار ساڵی بە باشتر دادەنرێت!

هەر بەم جۆرە، بەرپابوونی قیامەتیش ئەجەلی ئەم دنیایەی خۆمانە، کە دەڵێی مرۆڤێکی گەورەیە. جا ئەگەر کاتەکەی دیاریکراو بوایە، ئەوا سەدەکانی پێشین و ناوەڕاست لە خەوی بێئاگاییدا ژیانیان بەسەر دەبرد و، سەدەکانی دواییش لە ترس و بیمدا دەمانەوە. چونکە مرۆڤ هەروەك بە حوکمی ژیانی کەسی و ڕۆژانەی خۆی پەیوەندیی بە خانە و لانەو شارەکەی خۆیەوە هەیە، بە هەمان جۆر و بە حوکمی ژیانە کۆمەڵایەتی و مرۆڤانەکەی پەیوەندییەکی گەلێ پتەویشی بە خانووە مەزن و شارە هەرەگەورەکەیەوە هەیە، کە دنیایە.

لەمەوە تێدەگەین کە ئەو نزیکییەی لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ﴾ دا (القمر:١) باس کراوە، تێپەڕبوونی هەزار و ئەوەندە ساڵ هەڵی ناوەشێنێتەوە، چونکە قیامەت ئەجەلی دنیایە. خۆ ڕێژەی هەزار و دوو هەزار ساڵ لە چاو تەمەنی دنیادا وەك ڕێژەی ڕۆژ و دوو ڕۆژ و خولەك و دوو خولەك وایە لە چاو ساڵەکانی تەمەنی مرۆڤدا.

دەبێ ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە بەرپابوونی قیامەت تەنها ئەجەلی گرۆی مرۆڤ نییە تاکو بەپێی تەمەنی مرۆڤ نزیکی و دوورییەکەی لێك بدرێتەوە، بەڵکو ئەجەلی گشت بوونەوەران و ئاسمانەکان و زەوییە، کە خاوەنی تەمەنی هێندە زۆرن لە حساب کردن و نێکدانەوە نایەن.

له‌به‌ر ئه‌مه‌یه‌ كه‌ خواوه‌ندی دانای زانا كاتی به‌رپابوونی قیامه‌تی له‌ زانیاریی خۆی و له‌ نێوان پێنج شته‌ غه‌یبی‌یه‌كاندا شاردووه‌ته‌وه‌. یه‌كێك له‌ حیكمه‌ته‌كانی ئه‌م شاردنه‌وه‌یه‌ش ئه‌وه‌یه‌ كه‌ خه‌ڵكی هه‌موو سه‌رده‌مێك ترسی به‌رپابوونی قیامه‌تیان بێت. ته‌نانه‌ت له‌و سه‌رده‌مه‌دا هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كان زیاتر له‌ به‌رپابوونی قیامه‌ت ده‌ترسان تاكو كه‌سانی دوای خۆیان، هه‌رچه‌نده‌ش له‌ باشترین سه‌ده‌ و كاتدا ده‌ژیان، كه‌ سه‌ده‌ی به‌خته‌وه‌ری و ده‌ركه‌وتنی ڕاستی‌یه‌كان بووه‌. ته‌نانه‌ت هه‌ندێكیان وتوویانه‌: نیشانه‌كانی قیامه‌ت هاتوونه‌ته‌ دی!

جا ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ له‌م سه‌رده‌مه‌ی خۆماندا شاره‌زای حیكمه‌ت و حه‌قیقه‌تی: "شاردنه‌وه‌ی كاتی به‌رپابوونی قیامه‌ت" نین، به‌ سته‌م و ناڕه‌وا ده‌ڵێن:

هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كان - خوایان لێ ڕازی بێت - چۆن له‌و گومانه‌دا بوون كه‌ ڕوودانی ڕاستی‌یه‌كی گرنگ و سامناكی دوای هه‌زار و چوارسه‌د ساڵ به‌ نزیك بزانن له‌ سه‌رده‌مه‌كه‌ی خۆیانه‌وه‌، له‌ كاتێكدا كه‌ ئه‌وان باشترین و به‌تواناترینی موسڵمانان بوون له‌ تێگه‌یشتنی واتاكانی دواڕۆژدا و هه‌ست و شعووریشیان له‌ هی گشت ئیمانداران تیژتر بووه‌ سه‌باره‌ت به‌ په‌ی بردنیان به‌و شتانه‌ی له‌ ڕۆژگارانی داهاتوودا دێن؟ ده‌ڵێی بیری ئه‌وان هه‌زار ساڵ له‌ ڕاستی دوور كه‌وتووه‌ته‌وه‌!

**وه‌ڵام**: چونكه‌ هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كان - خوایان لێ ڕازی بێت - له‌ هه‌موو خه‌ڵكی زیاتر بیریان له‌ دواڕۆژ كردووه‌ته‌وه‌ و، یه‌قینیشیان دامه‌زراوتر بووه‌ به‌ نه‌مان و له‌ناوچوونی دنیا و، له‌ هه‌موو خه‌ڵكی زیاتر له‌و حیكمه‌ته‌ خوایی‌یه‌ش تێ گه‌یشتوون كه‌ خوای گه‌وره‌ كاتی به‌رپابوونی قیامه‌تی پێ شاردووه‌ته‌وه‌، ئه‌مه‌ش به‌ فه‌زڵی نووری به‌رده‌وامی هاوه‌ڵێتیی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌سه‌ریان. له‌به‌ر ئه‌وه‌، ئه‌وان وه‌ك كه‌سێك چاوه‌ڕوانی ئه‌جه‌لی خۆی بكات، ئاوا چاوه‌ڕوانی ئه‌جه‌لی دنیایان كردووه‌ و خۆیان بۆ مردنی ئاماده‌ كردووه‌ و، به‌ چوستی و لێبڕانه‌وه‌ بۆ دواڕۆژیان تێ كۆشاون.

پاشان دووپات كردنه‌وه‌ی "... فانتظروا الساعة" له‌ لایه‌ن پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ ﷺ له‌م حیكمه‌تی "شاردنه‌وه‌ و په‌نهان كردن"ه‌وه‌ سه‌رچاوه‌ ده‌گرێت و، ڕێنمایی‌یه‌كی ڕه‌وانی پێغه‌مبه‌رانه‌یه‌ و، هه‌رگیز ده‌ستنیشان كردنی كاتی به‌رپابوونی قیامه‌ت نی‌یه‌ له‌ ڕێی "وه‌حی"یه‌وه‌ تا وا گومان ببرێت كه‌ له‌ ڕاستی‌یه‌وه‌ دوور بێت، نه‌خێر، چونكه‌ "حیكمه‌ت" و "عیلله‌ت"ی هه‌رشتێك له‌ یه‌كتر جیان.

سه‌رجه‌می ئه‌و فه‌رمووده‌ پیرۆزانه‌ی كه‌ به‌م شێوه‌یه‌ن، له‌م حیكمه‌تی "شاردنه‌وه‌ و په‌نهان كردن"ه‌وه‌ سه‌رچاوه‌ ده‌گرن.

هه‌ر له‌سه‌ر بناغه‌ی هه‌مان حیكمه‌ته‌ كه‌ خه‌ڵكی له‌ دێر زه‌مانه‌وه‌، ته‌نانه‌ت هه‌ر له‌ سه‌رده‌می تابیعینه‌وه‌، چاوه‌ڕوانی په‌یدابوونی "مه‌هدی" و "ده‌ججالی سوفیانی"یان كردووه‌،

بەو هیوایەی کە ئەگەر بە سەردەمی "مەهدی" گەیشتن شوێنی بکەون. تەنانەت هەندێ لە ئەولیا و پیاوچاکان وتوویانە کە ئەو کەسانە کاتیان بەسەرچووە.

جا حیکمەتی دەستنیشان نەکردنی کات و سەردەمی پەیدا بوونیان، هەمان حیکمەتی دەستنیشان نەکردنی ڕۆژی قیامەتە، کە بەمەی خوارەوە ئەو حیکمەتە کورت دەکەینەوە:

هەموو کات و سەردەمێك پێویستی بە واتا و ناوەرۆکی "مەهدی"یە، کە دەبێت بە بناغەیەك بۆ ورە و هێزی مەعنەوییان و، لە نائومێدی ڕزگاریان دەکات. کەواتە دەبێ هەموو سەردەمێك بەشێکی لەم واتایە هەبێت. هەروەها دەبێ خەڵکی هەموو سەردەمێك لە مەترسیی کەسانی خراپکار وریا و بێدار بن، لەوانەی کە سەرۆکایەتیی نیفاق دەکەن و، پێشەوای هێز و تەوژمێکی گەورەی شەڕ و خراپکارین، تاکو مرۆڤی هیچ سەردەمێك بە گوێنەدان و بایەخ پێنەدان، ئەم لایەنە پشت گوێ نەخات و جڵەو بۆ نەفس شل نەکات!

خۆ ئەگەر کاتی پەیدابوونی "مەهدی" و "دەججال" و کەسانی هاوچەشنیان دەستنیشان کرابوایە، ئەوا بەرژەوەندیی ئیرشاد و حیکمەتی ڕێنمایی بەزایە دەدرا و لەدەست دەچوو!

ئنجا نهێنیی جۆراوجۆریی ئەو ڕیوایەتانەش کە لە بارەی ئەم دوانەوە هەن، بریتییە لەوەی کە:

ئەو کەسانەی فەرموودە پیرۆزەکانی ئەم بابەتەیان لێك داوەتەوە، ئیجتیهاد و تێگەیشتنەکانی خۆیان تێکەڵی دەقی فەرموودەکان کردووە، وەك ئەوەی کە بەپێی بۆچوونی خۆیان ڕووداوەکانی "مەهدی" و "دەججال"یان وا لێك داوەتەوە کە لە دەوروبەری شام و بەصرە و کووفە ڕوو دەدەن! چونکە لەو سەردەمانەدا ئەمانە گرنگترین شاری نزیکی مەڵبەندی خەلافەت بوون لە مەدینەی مونەووەرە و شامدا..

یان بۆ لێکدانەوەی ئەو فەرموودانە پێیان وابووە ئەو ئاسەوارە مەزنانەی کە "کەسێتیی مەعنەوی"ی "مەهدی" و "دەججال" دەنوێنن یان دەستە و تاقمەکانیان ئەنجامیان دەدەن، هی کەسایەتیی خودی ئەو تاکە کەسانە بن! ئەم چەشنە لێکدانەوەیەش بوو بە مایەی ئەوەی کە وا بزانرێت ئەو جۆرە کەسانە بە شێوەیەکی نائاسایی پەیدا دەبن و، هەموو خەڵکیش دەیانناسن! کەچی لە ڕاستیدا - وەك پێشتر وتمان- دنیا گۆڕەپانی ئیمتیحان و تاقیکردنەوەیە و، خواوەندیش کاتێ کە مرۆڤ تاقی دەکاتەوە ئیختیاری لێ داناماڵێت، بەڵکو دەرگای ئیختیار لە بەردەم ژیریی ئەودا دەخاتە سەر پشت تاکو سەرپشك بێت لە هەڵبژاردنی هەر هەڵوێستێکدا کە پێی پەسەند بێت. لەبەر ئەوە، ئەو جۆرە کەسانە - واتە: "دەججال" و مەهدی" - لە کاتی پەیدا بوونیاندا لە لایەن کەسانێکی زۆرەوە ناناسرێن، تەنانەت ئەو

ده‌ججاله سامناكه‌ش له سه‌ره‌تادا نازانێت كه خۆی ده‌ججاله، به‌ڵكو ئه‌وانـه ده‌يناسـن كـه بـه نووری ئیمانی تیژی ناخبین بۆی ده‌ڕوانن.

سه‌باره‌ت به ده‌ججاله‌وه، كه یه‌كێكه له نیشانه‌كانی قیامـه‌ت، پێغه‌مبـه‌ر ﷺ فه‌رموویـه‌تی: ڕۆژێكـی وه‌ك سـاڵێك وایـه و ڕۆژێكیشـی وه‌ك مـانگێك و ڕۆژێكیشـی وه‌ك حه‌فته‌یـه‌ك و ڕۆژه‌كانی تریشی وه‌ك ڕۆژانی ئێوه وایه[1] و، هه‌موو دنیاش ده‌نگی ده‌بیستن و، به ماوه‌ی چل ڕۆژیش گه‌شتی زه‌وی ده‌كات.

جـا ئـه‌و كه‌سانه‌ی كـه ویژدانیـان بـه‌كار نـه‌هێناوه، وتوویانـه: ئـه‌م ڕیوایه‌تـه مه‌حاڵـه و، ئینكاری‌یان كردووه. نه‌خێر، هه‌رگیز مه‌حاڵ نی‌یه، به‌ڵكو حه‌قیقـه‌تی ئه‌م ڕیوایه‌تـه – والعلم عند الله – ئه‌مه‌ی خواره‌وه‌یه:

فه‌رمووده پیرۆزه‌كه ئاماژه‌ی تێدایه بۆ سه‌رهه‌ڵدانی كه‌سێك لـه لایـه‌نی بـاكووره‌وه – كـه چڕترین ناوچه‌ی جیهانی كـوفره – و بۆ ئه‌وه‌ش كـه سـه‌ركردایه‌تیی تـه‌وژمێكی مـه‌زنی به‌رهـه‌م و ئـه‌نجامی مادديه‌تی سه‌رسـه‌خت ده‌خاتـه ئه‌ستۆی و، خـه‌ڵكی بـۆ لای ئیلحـاد و ئینكاری كردنی به‌دیهێنه‌ر بانگ ده‌كات.

جـا واتـای ئـه‌م فه‌رمووده‌یـه ئامـاژه‌ی تێدایـه بـۆ سـه‌رهه‌ڵدانی ئـه‌و كه‌سـه لـه بـاكووری جیهانه‌وه و، ئه‌م ئاماژه‌یه‌ش هێمایه‌كی حه‌كیمانه‌ی تێدایه كه بریتی‌یه له‌وه‌ی:

ساڵێكی بازنه نزیكه‌كه‌ی جه‌مسه‌ری باكوور شه‌و و ڕۆژێكه، چونكه شـه‌ش مـانگی سـاڵ لـه‌وێ شـه‌وه و شه‌شـه‌كه‌ی تریشـی ڕۆژه. واتـه ڕۆژه‌كـه‌ی ئـه‌م ده‌ججالـه سـاڵێكه، وه‌ك لـه فه‌رمووده‌كه‌دا هاتووه: "ڕۆژێكی ده‌ججال ساڵێكه" كه ئه‌مه‌ش ئاماژه‌یه بۆ ئـه‌وه‌ی لـه نزیكـی ئه‌و بازنه‌یه‌وه په‌یدا ده‌بێت. مه‌به‌ستیش له‌وه‌ی كه " ڕۆژی دووهه‌می مانگێكه" ئه‌وه‌یه كه هه‌تا له باكووره‌وه به‌ره‌و ناوچه‌كانی خۆمان بێین وای لـێ دێت كه هـه‌ندێ جـار مـانگێكی تـه‌واو یه‌ك ڕۆژ ده‌بێت، چونكه له هاویندا یه‌ك مانگ خۆر ئـاوا نـابێت. ئه‌مـه‌ش ئاماژه‌یـه‌كی تـره بـۆ ئـه‌وه‌ی كـه دوای ئـه‌وه‌ی ده‌ججـال لـه بـاكوور سـه‌ری هـه‌ڵدا، ئـه‌وێ جـێ ده‌هێڵـێ و بـه‌ره‌و جیهانی شارستانێتی دێت..

ئه‌م ئاماژه‌یه‌ش لـه گێڕانه‌وه(إسناد)ی ڕۆژه‌وه بۆ لای ده‌ججال ، هاتووه.. به‌م چه‌شنه هـه‌تا له باكووره‌وه به‌ره‌و باشوور نزیك ببینه‌وه ده‌بینین "خۆر" یه‌ك حه‌فته ئـاوا نـابێت، تـا وای لـێ دێت جیاوازیی نێوان خۆرهه‌ڵهاتن و خۆر ئاوابوون سێ كاتژمێر ده‌بێت. ئـه‌و كاتـه‌ی كـه لـه

---

(١) الأحاديث في هذا الباب كثيرة نذكر منها: رواية مسلم: "قلنا يا رسول الله: ما لبثه في الأرض؟ قال: أربعـون يوماً، يوم كسنة، ويوم كشهر، ويوم كجمعة، وسائر أيامه كأيامكم". (صحيح مسلم بشرح النـووي ٦٦/١٨) وأخرجه بسياق قريب أبو داود (٤٣٢١، ٤٣٢٢)، والترمذي كلهم من حديث النواس بن سمعان رضي الله عنـه. (وه‌رگێڕ – له چاپه عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌وه هێناویه‌تی).

ڕووسیا دیل بووم لە شوێنێکی وەك ئەمەدا بووم، ئەوەبوو لە شوێنێکی نزیکمانەوە خۆر تا یەك حەفتە ئاوا نەدەبوو، تەنانەت خەڵکی دەچوونە دەرەوە بۆ بینینی دیمەنی ناوازەی خۆرئاوابوون!

سەبارەت بە گەیشتنی دەنگی دەججال بە هەموو شوێنێکی جیهان و، گەشت کردنیشی بە ماوەی چل ڕۆژ بە زەوی‌دا، ئەوا ئامێرەکانی ڕادیۆ و تەلگراف و تەلەفۆن و، هۆکارە تازەکانی گواستنەوەی چەشنی شەمەندەفەر و فڕۆکە، شیتەڵیان کردوونەتەوە. خۆ ئەو مولحیدانەی کە تا دوێنێ ئەم دوو حاڵەتەیان بە مەحاڵ دەزانی و ئینکاری‌یان دەکردن، ئەمڕۆ وەك شتێکی ئاسایی دەیبینن.

سەبارەت بە یەئجووج و مەئجووج و بەربەستەکەشەوە کە نیشانەی قیامەتن، لە پەیامێکی تردا هەندێ بە درێژی لەسەرم نووسیون، خوێنەری بەڕێز بۆ ئەوێ ڕەوانە دەکەم. بەڵام لێرەدا دەڵێم: هەروەك دوێنێ دوو تیرەی: "مانجۆر" و "مەغۆل" کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی‌یان کاول کرد و بوون بەهۆی بنیاتنانی بەربەستی چین، گەلێ ڕیوایەتیش هەن کە ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی لەگەڵ نزیك بوونی بەرپابوونی قیامەتیشدا شارستانێتیی نوێ دادەڕمێت و بە زەبری شەقی سامناکی بیروباوەڕە تۆقێنەر و ئاژاوەچی‌یەکەی ئەوان کاول دەبێت.

**لێرەدا هەندێ کەسی مولحید دەپرسن:**

ئەم دەستە و تاقمەی ئادەمیزاد لە کوێن کە پێشتر ئەم چەشنە کارانەیان ئەنجام داوە و لەمەولاش ئەنجامی دەدەن؟

**وەڵام:** "کوللە" دەرد و پەتایەکی کشتوکاڵی‌یە و، لە وەرزێکی تایبەتی‌دا ناوچەیەکی دیاریکراو دادەگرێت و پاشان بەپێی گۆڕانی وەرز بە تەواوی ون دەبێت. جا تایبەتکاری‌یەکانی ئەو ڕەگەزانەی کوللە کە کشتوکاڵی ئەو ناوچەیان تەفروتونا کرد، لەناو ناخی هەندێ تاکی دەستنیشانکراوی ئەواندایە و، هەمان دەرد و پەتا - بە فەرمانێکی خوایی - لە وەرزێکی دیاریکراودا و بە ژمارەیەکی زۆر، سەر هەڵدەدەنەوە. واتە حەقیقەتی ڕەگەزەکانیان لەبەر چاودا نامێنن، بەڵام ناپووکێنەوە، تاکو سەر لەنوێ لە وەرزێکی دیاریکراودا سەر هەڵبدەنەوە.

هەروەك ئەم دیاردەیە لە کوللەدا بەم شێوەیە.. بە هەمان جۆر، ئەو نەتەوانەش کە لە سەردەمێکدا خراپکاری‌یان بە ناو جیهاندا بڵاو کردەوە، لە کاتێکی دیاریکراودا و بە فەرمان و ویستی خوای گەورە، بۆ لەناوبردنی مرۆڤایەتی سەر هەڵدەدەنەوە و، جارێکی تریش شارستانێتیی مرۆڤ دەڕووخێننەوە. بەڵام وورووژاندنی ئەم جارەیان بە شێوەیەکی تر دەبێت! ولا یَعلمُ الغیبَ إلاّ اللّٰه.

**❑ ده‌ستووری نۆهه‌م:**

داهات و به‌رهه‌می هه‌ندێ بابه‌ت و مه‌سه‌له‌ی "ئیمانی" ڕوویان له‌ چه‌ند كاروبارێكی سه‌ر به‌م جیهانه‌ ته‌سك و پابه‌نده‌ی دنیایه‌ و، هی به‌شێكی تریشیان ڕووی له‌ جیهانی هه‌میشه‌یی سه‌ربه‌ست و فراوانه‌..

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به‌شێكی ئه‌و فه‌رمووده‌انه‌ی له‌ باره‌ی نرخ و به‌های كرده‌وه‌ چاكه‌كانه‌وه‌ ده‌دوێن، پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ به‌ شێوازێكی ڕه‌وانبێژی ئه‌وتۆ ده‌ری‌بڕیون كه‌ له‌گه‌ڵ حیكمه‌تی "ته‌رغیب و ته‌رهیب"دا بگونجێ، ئه‌وا هه‌ندێ له‌و كه‌سانه‌ی كه‌ به‌ وردی ناڕوانن، گومانیان وا بردووه‌ كه‌ ئه‌و فه‌رموودانه‌ موباله‌غه‌یان تێدا بێت! نه‌خێر هه‌رگیز موباله‌غه‌یان تێدا نی‌یه‌، به‌ڵكو هه‌موویان عه‌ینی ڕاستی و حه‌قیقه‌تن.

بۆ نموونه‌: ئه‌و شته‌ی كه‌ زه‌ینی كه‌سانی بێ ویژدان ده‌ڕووشێنێت و ده‌یانهه‌ژێنێت، ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ی خواره‌وه‌یه‌:

"لو كانت الدنيا تَعْدِلُ عند الله جناحَ بعوضةٍ ما شرب الكافر منها جرعة ماء"[1] أو كما قال.

حه‌قیقه‌تی ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ بریتی‌یه‌ له‌وه‌ی كه‌:

وشه‌ی "عنـد الله" له‌م فه‌رمووده‌یه‌دا جیهانی هه‌میشه‌یی ده‌گه‌یه‌نێت. چونكه‌ ئه‌و ڕووناكی‌یه‌ی كه‌ له‌ جیهانی هه‌میشه‌یی‌یه‌وه‌ تیشكی دابێت - با هێنده‌ی باڵه‌ مێشووله‌یه‌كیش بێت - له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌میشه‌یی‌یه‌، ئه‌وا گه‌لێ گشتی و فراوانتره‌ له‌چاو نوورێكی كاتی‌دا، با پڕ به‌ پڕی گۆی زه‌ویش بێت.

واتای ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ به‌راورد له‌ نێوان باڵه‌ مێشووله‌ و جیهانی گه‌وره‌دا ساز ناكات، به‌ڵكو بۆ به‌راوردكردنی دنیای هه‌موو كه‌سێكه‌ - كه‌ له‌ چوارچێوه‌ی ته‌مه‌نه‌ كورته‌كه‌یدایه‌ - له‌گه‌ڵ نووری به‌رده‌وام دره‌خشانی ئه‌و دنیادا، هه‌رچه‌نده‌ش به‌ ئه‌ندازه‌ی باڵه‌ مێشێكی ڕێژنه‌ی خوای گه‌وره‌ و چاكه‌كاری‌یه‌ گشتی‌یه‌كه‌ی ئه‌و بێت.

پاشان دنیا دوو، به‌ڵكو سێ ڕووی هه‌یه‌:

*یه‌كه‌م:* ڕوویه‌كه‌، به‌ چه‌شنی ئاوێنه‌، دره‌وشانه‌وه‌ی ناوه‌ جوانه‌كانی خوا ده‌داته‌وه‌.

---

(١) أصل الحديث: "لو كانت الدنيا تعدل عند الله جناح بعوضة ما سقى كافراً منها شربة ماء" حديث صحيح: أخرجه الترمذي (٢٤٢٢) "تحفة" وأبو نعيم في حلية الأولياء (٢٥٣/٣) والحاكم (٣٠٦/٤) وابن عدي في الكامل (٢٤٩/١) والعقيلي في الضعفاء وعزاه في الجامع الصغير للضياء في المختارة، كلهم من حديث سهل بن سعد رضي الله عنه، وقال الترمذي: هذا حديث صحيح غريب من هذا الوجه وصححه الحاكم. (وه‌رگێڕ -له‌ چاپه‌ عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌وه‌ هێناویه‌تی).

دووهەم: ڕوویەکە دەڕوانێتە ئەودنیا، واتە دنیا لەم ڕووەدا کێڵگەی قیامەتە.

سێهەم: ئەو ڕووەیە کە بۆ عەدەم و نەمان دەڕوانێت.

تەنها ئەم ڕووی سێهەمەیە کە خوای گەورە لێی ڕازی نی‌یە و، بە دنیای ئەهلی گومڕایی ناسراوە.

کەواتە مەبەست بەو دنیایەی لە فەرموودە پیرۆزەکەدا باس کراوە دنیا مەزنەکە نی‌یە کە ئاوێنەی ناوە جوانەکانی خوایە و چەند نامەیەکی صەمەدانی‌یە، هەروەها ئەو دنیایەش نی‌یە کە کێڵگەی دواڕۆژە، بەڵکو مەبەست دنیا پێچەوانەکەی ئاخیرەتە کە سەرچاوەی هەموو گوناهـ و تاوانێك و کانگای گشت بەڵا و گیروگرفتێکە و، هی دنیاپەرستانە کە لەچاو ئەو جیهانە هەمیشەیی‌یەی دواڕۆژدا، کە بە بەندە ئیماندارەکانی خواوەند دەبەخشرێن، کێشی گەردیلەیەکیشی نی‌یە.

جا ئەم حەقیقەتە ڕاست و ڕەوایە چەندە دوورە لەو گومانەی ئەهلی ئیلحادی ستەمکار، کە بە موبالەغەیان لە قەڵەم دەدا.

نموونەیەکی تر: مولحیدان بە تەواوی پێیان لە بێ ویژدانی ڕاکێشاوە و لەو گومانەدا بوون کە: ئەو باسانەی لە بارەی "پاداشتی کردەوەکان" و "فەزڵی هەندێ سوورەتی قورئان"ەوە لە فەرموودە پیرۆزەکاندا ڕیوایەت کراون، موبالەغەیەکی دوور لە ژێری‌یان تێدا بێت. تەنانەت وتووشیانە: ئەوانە مەحاڵن!

بۆ نموونە: لە فەرموودەدا هاتووە کە خوێندنی سوورەی "فاتیحە" پاداشتی هەموو قورئانی هەیە[1] و، سوورەی "ئیخلاص"یش هاوسەنگی سێیەکی قورئانە[2] و، سوورەی "الزلزلة"یش چواریەکی قورئانە[3] و، سوورەی "الکافرون"یش چواریەکی

---

(١) حديث: "الحمد لله رب العالمين هي السبع المثاني الذي أوتيتُه والقرآن العظيم". أخرجه البخاري ٣٢٢/٦ وأبو داود ١٤٥/١ والنسائي ١٣٩/٢ من حديث أبي سعيد المعلى. (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی).

(٢) حديث: "قل هو الله أحد تعدل ثلث القرآن". أخرجه البخاري ٣٢٥/٦ ومالك في الموطأ وأحمد في المسند وأبو داود ١٤٦١ والنسائي من حديث أبي سعيد الخدري رضي الله عنه. (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی).

(٣) عن أنس بن مالك رضي الله عنه: أن رسول الله ﷺ قال لرجل من أصحابه: هل تزوجت يا فلان؟ قال: لا والله، ولا عندي ما اتزوج به، قال: أليس معك قل هو الله؟ قال: بلى. قال: ثلث القرآن. قال: أليس معك إذا جاء نصر الله والفتح قال: بلى. قال: ربع القرآن. قال: أليس معك قل يا أيها الكافرون؟ قال: بلى. قال: ربع القرآن. قال: أليس معك إذا زلزلت الأرض؟ قال: بلى. قال: ربع القرآن. قال: تزوج تزوج.. أخرجه الترمذي (٣٠٥٨) "تحفة" وقال: هذا حديث حسن، وأحمد (١٤٦/٣ - ١٤٧) والخطيب في تاريخ بغداد (٣٨٠/١١) وعزاه

قورئانە[١] و، سوورەی "یس"یش دە هێندەی قورئان پاداشتی هەیە[٢].

جا ئەو کەسانەی کە بە وردی و لەسەرخۆیی ناڕواننە ئەم باسە و خاوەنی ویژدان نین، ناوەڕۆکی ئەم ڕیوایەتانەیان پێ مەحاڵە، چونکە دەڵێن: چۆن دەکرێ تەنها سوورەتی "یـس" ئەم هەموو فەزڵەی ببێت لە کاتێکدا کە تەنها سوورەتێکی قورئانە و گەلێ سوورەتی خاوەن فەزڵی تریش لە قورئاندا هەن؟

**وەڵام**: ڕاستیی ئەم ڕیوایەتانە بریتی‌یە لەوەی کە:

هەموو یەکێك لە پیتەکانی قورئانی پیرۆز پاداشتێکی هەیە، کە بریتی‌یە لەوەی بە یەك "کردەوەی چاك" دەژمێررێت، بەڵام بە فەزڵ و بەخشندەیی خوای گەورە پاداشتی ئەم پیتانە زیاد دەکەن تا هەندێ جار دە "چاکە" بەرهەم دەهێنن و هەندێ جاریش حەفتا و هەندێ جاری تریش حەوسەد (وەك لە پیتەکانی آیة الكرسي)دا، جاری واش هەیە هەزار و پێنج سەد (وەك پیتەکانی سوورەی ئیخلاص) هەندێ جاری دیکەش دە هەزار "چاکە" بەرهەم دەهێنن (وەك خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان لە کاتە باشەکان و شەوی نیوەی شەعباندا) هەندێ جاری تریش سی هەزار بەرهەم دەهێنن (وەك خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان لە شەوی قەدردا). بەم جۆرە، چاکە و پاداشتەکان پەرە دەسێنن و زیاد دەکەن. دەتوانرێت لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾دا (القدر:٣) زیادبوونی پاداشت بۆ سی هەزار وەربگیرێت.

---

الحافظ في الفتح (٩/٦١ - ٦٢) لابن أبي شيبة وأبو الشيخ مع زيادة في الحديث وقال: وهو حديث ضعيف لضعف سلمة، وإن حسنه الترمذي إهـ. قلت: وباقي رجال الإسناد ثقات. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی).

(١) حديث ابن عمر: "قل هو الله أحد تعدل ثلث القرآن، وقل يا أيها الكافرون تعدل ربع القرآن". حسن: أخرجه الطبراني في الكبير (١٣٤٩٤) وفي الأوسط (٦٦ مجمع البحرين) مطولاً. ورواه البزار (٥١٢ زوائد البزار) وأورده الهيثمي في المجمع (٢/٩٠) وقال: وفي إسناد الطبراني ليث بن حماد ضعفه الدار قطني وإسناد البزار حسن. إهـ. وتعقبه محقق الطبراني بقوله: فيهما ليث بن أبي سليم وحاله معروف. إهـ. والحديث في صحيح الجامع الصغير وزيادته برقم (٤٢٨١) وصححه. وانظر الصحيحة برقم ٥٨٨. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی).

(٢) عن انس بن مالك قال: قال رسول الله ﷺ: "إن لكل شيءٍ قلباً وقلب القرآن يس، ومن قرأ يس كتب الله له بقراءتها قراءة القرآن عشر مرات". أخرجه الترمذي (٣٠٤٨ تحفة) وقال: هذا حديث حسن غريب، لا نعرفه إلاّ من حديث حميد بن عبدالرحمن، وبالبصرة لا يعرفون من حديث قتادة إلاّ من هذا الوجه، وهارون أبو محمد مجهول. إه. وأخرجه الترمذي ايضاً برقم (٣٠٤٩ تحفة) والدارمي (٢/٤٥٦). (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی).

بەم جۆرە دەرکەوت کە مەبەست لەو فەرموودانە بەراورد و هاوسەنگ کردنی ئەو سوورەتانە نی‌یە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا بەم پاداشت زیادبوونە بەردەوامەیەوە، نەخێر، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە: دەکرێ پاداشتی زیادبوونی هەندێ سوورەت لەگەڵ پاداشتە بنەڕەتی‌یەکەی قورئاندا بەراورد و هاوسەنگ بکرێن.

با بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بکەینەوە:

گریمان کێڵگەیەك هەزار دەنکە گەنمەشامیی تێدا چێنرابێت، خۆ ئەگەر تەنها دەنکێك لەو هەزارە حەوت گلك بگرێت و هەریەك لەو گلکانەش سەد دەنکیان پێوە بێت، ئەوا ئەو کاتە یەك دەنك لەو گەنمەشامی‌یانە بەرامبەر دوو لەسەر سێی گەنمەشامی‌یە چێنراوەکانی ناو کێڵگەکە دەردەچێت.

هەروەها ئەگەر وا دابنێین دەنکێکی تر دە گلکی گرتبێت و هەریەك لەو گلکانەش سەد دەنکە گەنمەشامیان پێوە بێت، ئەوا هەر تەنها ئەو دەنکە گەنمەشامی‌یە یەکسان دەبێت بە دوو هێندەی ئەوەی لە کێڵگەکەدا چێنراون!

بۆ خۆت لەبەر ڕووناکیی ئەم نموونەیەدا ئەمەی خوارەوە لێك بدەرەوە:

وا ئێستا قورئانی پیرۆز بە وێنەی کێڵگەیەکی نوورانی و موقەددەسی ئاسمانیی ئەوتۆ تەسەوور دەکەین کە هەر پیتێکی بە پاداشتە بنەڕەتی‌یەکەی خۆیەوە - بێ گوڵەگەنم و گلکەکانی - وەك دەنکە دانەوێڵەیەك وایە. جا ئەگەر ئەمە بەسەر نموونەکەی پێشوودا جێ‌بەجێ بکەیت، ئەوا دەتوانیت لە فەزڵ و گەورەیی سوورەتەکانی: (یس، الإخلاص، الکافرون، الزلزلة) تێ‌بگەیت کە فەرموودەی پیرۆزیان لە بارەوە هاتووە، لەچاو پاداشتی بنەڕەتیی پیتەکانی قورئاندا.

نموونەی ئەمە:

پیتەکانی قورئانی پیرۆز سێ‌سەد هەزار و شەش سەد و بیست پیتن. پیتەکانی سوورەی ئیخلاسیش لەگەڵ ﴿بسم الله﴾دا شەست و نۆ پیتن. خۆ سێ هێندەی شەست و نۆ دانەش دەکاتە دووسەد و حەوت پیت. واتە پاداشتی هەریەك لە پیتەکانی سوورەی ئیخلاس نزیکی هەزار و پێنج سەد پاداشت دەردەچێت. بە هەمان جۆر، ئەگەر پیتەکانی سوورەی "یاسین"یش بژمێریت و ڕێژەی ئەو پیتانە لەگەڵ سەرجەمی پیتەکانی قورئاندا بهێنیت و پاشان زیادە پاداشتی "یەك بە دە" ڕەچاو بکەیت، ئەوا دەبینیت کە هەر پیتێکی ئەو سوورەتە نزیکەی پێنج سەد پاداشتی هەیە.

خۆ ئەگەر بەم شێوەیە ئەو فەرموودانەی تریش لێك بدەیتەوە کە لە بارەی فەزڵ و گەورەیی سوورەتەکانی تری قورئانەوە ڕیوایەت کراون، ئەوا بۆت دەردەکەوێت کە چەندە

ئه‌و فه‌رموودانه ڕاستی‌یه‌كی ته‌واوی ڕه‌گداكوتاون و، چه‌نده‌ش دوورن له‌وه‌ی هیچ شتێكی ئه‌وتۆیان تێدا بێت كه‌ په‌نجه‌ بۆ موباله‌غه‌ و زیاده‌ڕه‌وی كردن له‌ گوفتاردا، درێژ بكه‌ن.

❑ **ده‌ستووری ده‌هه‌م:**

هه‌روه‌ك له‌ناو زۆربه‌ی جۆره‌كانی بوونه‌وه‌راندا ڕوو ده‌دات، به‌ هه‌مان جۆر له‌ناو مرۆڤیشدا هه‌ندێ جار كه‌سانێك په‌یدا ده‌بن كه‌ هه‌ندێ كار و ڕه‌فتاری ده‌راسایان پێوه‌ ده‌رده‌كه‌وێت. جا ئه‌گه‌ر ئه‌م كه‌سه‌ هه‌ڵكه‌وتووه‌ له‌ كاری خێر و چاكه‌دا پێش كه‌سانی تر كه‌وتبێته‌وه‌، ئه‌وا ده‌بێت به‌ مایه‌ی شانازیی هاوڕه‌گه‌زه‌كانی، ده‌نا مایه‌ی شووم و به‌ڵایه‌ بۆیان.

جا هه‌ریه‌ك له‌و جۆره‌ كه‌سه‌ هه‌ڵكه‌وتووانه‌ به‌ وێنه‌ی كه‌سایه‌تی‌یه‌كی مه‌عنه‌وی له‌ هه‌موو شوێنێكی كۆمه‌ڵدا سه‌ر هه‌ڵده‌دات و، كه‌سانی تر هه‌وڵ ده‌ده‌ن له‌و كارانه‌دا لاسایی ئه‌و بكه‌نه‌وه‌ و به‌ چوستی و لێبڕانه‌وه‌ تێ‌ده‌كۆشن بگه‌نه‌ ئاستی، كه‌ له‌وانه‌شه‌ هه‌ر ته‌نها یه‌كێكیان بتوانێت له‌ فلان یان فیسار كاردا پێی بگاته‌وه‌. كه‌واته‌ ئه‌م مه‌سه‌له‌یه‌ له‌ ڕووه‌ مه‌نتیقی‌یه‌كه‌یه‌وه‌ مه‌سه‌له‌یه‌كی مومكینه‌ و ده‌گونجێ به‌ چه‌شنێكی شاراوه‌ و نادیار و ڕه‌ها "تاك"ێكی ده‌راسای ئاوا له‌ناو ئه‌و "جۆر"ه‌ بوونه‌وه‌ره‌دا ببێت، واته‌ به‌م كاره‌ی بووه‌ به‌ كه‌سێكی هه‌مه‌كی(شخص كلي)، به‌و واتایه‌ی كه‌ ده‌گونجێ ئه‌م جۆره‌ كاره‌ به‌رهه‌مێ ئاوا ئه‌نجام بێنێت.

ئێستا فه‌رموو له‌ ڕووناكیی ئه‌م نموونه‌یه‌دا سه‌یری چه‌ند فه‌رمووده‌یه‌كی پیرۆز بكه‌ كه‌ به‌م واتایانه‌ی خواره‌وه‌ هاتوون:

"من صلّى ركعتين كذا فله أجر حجّة"[1] واته‌: پاداشتی دوو ڕكات له‌ چه‌ند كاتێكی دیاریكراودا به‌رامبه‌ر به‌ حه‌جێكه‌، ئه‌مه‌ش ڕاستی‌یه‌كی چه‌سپاوه‌. كه‌واته‌ "ده‌گونجێ" هه‌موو دوو ڕكاته‌ نوێژێك له‌ ڕووی هه‌مه‌كێتی‌یه‌وه‌ ئه‌م واتایه‌ هه‌ڵبگرێت، به‌ڵام ڕوودانی "ڕاسته‌قینه‌ی" ئه‌م جۆره‌ ڕیوایه‌تانه‌ نه‌ هه‌میشه‌یین و نه‌ گشتین، چونكه‌ "قبووڵبوون" چه‌ند مه‌رجێكی ده‌ستنیشان كراوی خۆی هه‌یه‌. له‌به‌ر ئه‌وه‌، ئه‌م چه‌شنه‌ ڕیوایه‌تانه‌ سیفه‌تی هه‌مه‌كێتی و به‌رده‌وامی‌یان تێدا نی‌یه‌ بۆ هه‌موو دوو ڕكاته‌ نوێژێكی وه‌ها. كه‌واته‌ له‌ ڕاستی‌دا یان كاتی و ڕه‌هان، یان مه‌سه‌له‌یه‌كی "مومكین"ی هه‌مه‌كین. هه‌مه‌كی‌بوونیش له‌م چه‌شنه‌

---

(١) عن أبي امامة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: (من صلى الغداة في جماعة ثم جلس يذكر الله حتى تطلع الشمس، ثم قام فركع ركعتين انقلب بأجر حجة وعمرة). أخرجه الطبراني في الكبير (٧٧٤٠) وفي مسند الشاميين (٨٨٥) وقال الحافظ المنذري في الترغيب والترهيب: إسناده جيد ومثله كلام الهيثمي في المجمع (١٠/١٠٤) وانظر الأحاديث الواردة في ذلك في صحيح الترغيب والترهيب برقم (٤٦٨ و ٤٦٩ و ٤٧٠).
(وه‌رگێڕ – له‌ چاپه‌ عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌وه‌ هێناویه‌تی).

فەرموودانەدا لە ڕووی ئیمکانی ئیعتیباری‌یەوەیە، وەکو ئەوەی کە وتراوە: "غەیبەت وەك قەتڵ وایە" کە مەبەست تیای‌دا ئەوەیە مرۆڤ بە غەیبەت کردن دەبێت بە ژەهرێکی کوشندە. هەروەها وەك: "قسەی جوان صەدەقەیەکی چەشنی ئازادکردنی بەندەیەکە".

حیکمەتی دارشتنی ئەم فەرموودانە بەم جۆرە شێوازانە لەوەدایە کە: ئیحتیمالی ڕوودانی ئەم سیفەتە مەعنەوی‌یە کاملە لە هەموو شوێنێك و بە شێوە ڕەهاکەی، پێش‌چاو بخرێت. چونکە بۆ مەبەستی ئامۆژگاری و تەرغیب و تەرهیب زیاتر جێ دەگرێت و پتر دەروونەکان بۆ کاری خێر هان دەدات و لە خراپکاری دووریان دەخاتەوە.

پاشان دەبێ بیشزانین کە کاروبارەکانی جیهانی هەمیشەیی بە تەرازووەکانی ئەم جیهانەی ئێستامان هەڵناسەنگێنرێن، چونکە دەگونجێ مەزنترین شتی ئەم جیهانەمان هێشتا بە بچووکترین شتی ئەوێ دانەنرێت و پێی بەراورد نەکرێت. جا پاداشتدانەوەی کردارەکان لەبەر ئەوەی ڕووی لەو جیهانە هەمیشەیی‌یەی ئەوێ‌یە، ئەوا تێڕوانینە دنیایی‌یە تەسکەکانمان لە ئاستی‌دا کورتە و، ئێمە لەوەدا دەستەوسانین کە بە ژیری‌یە سنووردارەکانمان پەیی پێ بەین.

بۆ نموونە: ڕیوایەتێك هەیە سەرنجی ئەو کەسانە ڕادەکێشێت کە بە وردی ناڕوانن و لە بڕیارەکانیاندا ویژدان بەکار ناهێنن، ئەویش بریتی‌یە لەو ڕیوایەتەی کە دەفەرموێت: "هەر کەسێك ئەمانە بخوێنێت بە وێنەی پاداشتی "مووسا و هاروون"ی دەدرێتێ:

"الحمد لله رب السموات ورب الأرضين رب العالمين، ولـه الكبرياء في السموات والأرض وهو العزيز الحكيم..

الحمد لله رب السموات ورب الأرضين رب العالمين، وله العظمة في السموات والأرض وهو العزيز الحكيم، وله الملك ربّ السموات وهو العزيز الحكيم".

حەقیقەتی ئەم فەرموودانە و هاووێنەکانیان، کە زەینەکان دەوروژێنن، ئەوەیە کە:

ئێمە مەودای ئەو پاداشتە نازانین کە دوو پێغەمبەری مەزنی وەك حەزرەتی مووسا و هاروون - درووديان لەسەر بێت - بە دەستی دەهێنن. مەگەر بەپێی بۆچوونەکانمان و لە چوارچێوەی بیری تەسك و ڕوانینی دنیایی کورت و کەممانندا، کەواتە حەقیقەتی ئەو پاداشتەی کە بە خوێندنی ئەو ویردە دەست بەندەیەکی تەواو کۆڵەوار دەکەوێت و لە لایەن پەروەردگارێکی بەسۆزی خاوەن میهرەبانیی ڕەهاوە لە ژیانێکی هەمیشەیی‌دا دەیدرێتێ، دەگونجێ بە وێنەی ئەو پاداشتە بێت کە بە عەقڵە کەم و کورتەکانی خۆمان و بەگوێرەی ئەندازەی زانیاری و ئاسۆی بیرکردنەوەمان بۆ ئەو دوو پێغەمبەرە مەزنەمان دانابوو!

ئێمە لەمەدا وەك ئەو مرۆڤە دەشتەكی‌یە واین كـە پادشـای نـەدیوە و پـەی بـە مەزنی‌یەكـەی نابات و لە ڕوانینی كـورت و بیركردنـەوەی تەسـكی خـۆی‌دا پادشـا بـە كەسـێكی وەك ڕیـش سپیی ئـاوایی یـان نـەختێ لـەو گـەورەتر دادەنێـت! تەنانـەت لـە خۆرهـەڵات(كوردسـتان)ی توركیادا كەسانێكی گوندنشینی هێندە ساویلكە و سادەمان لە دەوروبـەردا بـوون كـە دەیـان وت: پادشا لە نزیكی ئاگردانەكە دادەنیشێت و هەر بۆ خۆیشـی سەرپەرشـتیی ئامـادە كردنـی خواردنەكەی دەكات! بەو واتایەی كە ئەوپەڕی بۆچوونی گوندنشینەكە لە بارەی گـەورەیی پادشاوە ناگاتە ئاستی پلەی فەرماندەی تیپێكی سوپا. جا ئەگەر بە یەكێك لەو جـۆرە كەسـانە بوترێت: گەر فلانە كارم بۆ ئەنجام بدەیت بە پلەی پادشایی پاداشتت دەدەمەوە (واتە بـە پلـە و پایە و ڕێزی فەرماندەی تیپ) ئەم گوفتارە ڕاست دەبێـت، چونكـە پادشـا هـەر تەنـها هێنـدەی فەرماندەی تیپ خاوەنی مەزنایەتی‌یە لە زەین و بیری تەسكی گوێبیستەكەدا.

جـا ئێمـە وەختـە بـە وێنـەی ئـەم مرۆڤـە دەشتەكی‌یەش بـە ژێری‌یـە تەسـك و بـیرە كـورت و ڕوانینـە كـول و كاسـە دنیایی‌یەكـەمان لـەو ڕاسـتی‌یانە تێنەگـەین كـە لـە بـارەی پاداشـتی كردەوەكانەوە هاتوون و ڕوویان لە جیـهانی دواڕۆژە. چونكـە فـەرموودە پیرۆزەكـە بـەراورد ساز ناكات بۆ پاداشتی ڕاستەقینەی حەزرەتی مووسا و هـاروون – درووديـان لەسـەر بێـت – كـە لای ئێمـە نـەزانراوە، لەگـەڵ پاداشتی ئـەو بەندەیـەی كـە ویردەكـە دەخوێنێـت. نـەخێر.. چونكە قاعیدەی شوبهاندنی شتێك بە شتێكی تر بریتی‌یە لە: قیـاس كردنی شـتێكی "نـەزانراو" بە شتێكی "زانراو" واتە پەی‌بردن بە حوكمی شتە "نەزانراوەكە" لە ڕێی زانینی حوكمـی شـتە "زانراوەكە"وە.

واتە مەبەستی فەرموودەكە بەراوردكردنی ئەو پاداشتەیە كە بەپێی بۆچوونی خۆمان لامـان زانـراوە، لەگـەڵ پاداشـتی ڕاسـتەقینەی ئـەو بـەندە زیكرخوێنـە، كـە پاداشـتێكە لای ئێمـە نەزانراوە.

پاشـان ئـەو وێنـەیەی "خـۆر" كـە چ ڕووی دەریـا و چ دڵۆپێـك ئـاو دەیدەنـەوە، هـەمان وێنەیە و جیاوازی‌یان تەنها لە "نەوعییەت"دایە، ئـەوەتا هـەردووكیان وێنـە و ڕوونـاكیی خـۆر دەدەنەوە. كەواتە ڕۆحی هەریەك لە حەزرەتی مووسا و هاروون – دروودیـان لەسـەر بێـت – لـە ڕاستی‌دا ئاوێنەیـەكی بێ‌گـەردی وەك دەریایـە، ماهییـەتی پاداشـتەكانیان دەداتـەوە، وەك ئەوەی كە ڕۆحی ئەو بەندە زیكرخوێنەی كـە دەڵێی دڵۆپێـك ئـاوە پاداشتی زیكرەكـانی ئـەو بەندەیـە دەداتـەوە. كەواتـە لـە ڕووی: ماهییـەت و چەندایەتی‌یـەوە، پاداشـتی هـەردووك هـەر یەكێكە، بەڵام "جۆرەكانیان" جیاوازە، بە گوێرەی جیاوازیی قابیلییەتی ئاوێنەكان.

پاشان هەندێ جار وتنەوەی زیکر و تەسبیحاتێکی دیاری کراو، یان خوێندنەوەی تەنها یەك ئایەت، هێندە دەرگای میهرەبانی و بەختەوەری لە مرۆڤ دەکاتەوە کە پەرستشی شەست ساڵ ئەو دەرگایانەی لێ ناکاتەوە. واتە هەندێ "حاڵەت" هەن کە تەنها یەك ئایەت بە ئەندازەی سوودی سەرتاسەری قورئان سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت.

پاشان ئەو ڕێزنە پەروەردگارییانەی کە بە خوێندنەوەی تەنها یەك ئایەت لە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەردەکەون، لەوانەیە یەکسان بێت بە ڕێزنەیەکی کاملی ئەوتۆ کە خوای گەورە بە پێغەمبەرێکی تری دەبەخشێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ مایەی لێ‌دەرکەوتنی ئیسمی ئەعزەمە. جا ئەگەر بوترێت: "بەندەی زیکر خوێن، بە فەزڵی میراتگریی پێغەمبەرایەتی‌یەوە، بە بۆن و بەرامەیەکی سێبەری ئیسمی ئەعزەم بەهرەمەند بووە و، لە بازنەی قابیلییەت و لێهاتنی خۆی‌دا پاداشتێکی لەسەر ئەوە دەست کەوتووە بە ئەندازەی ئەو ڕێزنە خوایی‌یەی کە یەکێك لە پێغەمبەرانی تر پێی بەهرەمەند بووە" گەر ئەمە بوترێت، ئەوا هەرگیزاو هەرگیز ئەم قسەیە پێچەوانەی ڕاستی نابێت.

ئنجا ئەو پاداشتەی لێرەدا مەبەستە هی جیهانی ڕووناکیی هەمیشەیی‌یە، کە دەکرێ لەوێ جیهانێك لەناو تەنها یەك گەردیلەدا جێی ببێتەوە، بە چەشنی ئەوەی کە وێنەی ئاسمانەکان بە ئەستێرەکانیەوە لە پارچە شوشەیەکی بچووکدا جێی دەبێتەوە و تیای‌دا دەبینرێت! کەواتە هەر بەم جۆرە، خوێندنەوەی تەنها یەك ئایەت یاخود زیکرێکی دیاری کراو، بە نیازێکی بێ گەرد، دەگونجێ خاوێنی‌یەکی وەك شووشە لە ڕۆحی مرۆڤدا بەرهەم بێنێت و، بتوانێت پاداشتێکی نوورانیی وەك ئاسمانە فراوانەکان لە خۆی‌دا جێ بکاتەوە.

**ئەنجام:** ئەی ئەو کەسەی کە بێ لێکۆڵینەوە و لێ وردبوونەوە و، بە چاوی ڕەخنە و توانج دەڕوانێتە هەموو شتێك!! ئەی خاوەنی ئیمانی لاواز و بیری پڕ لە فەلسەفەی ماددی!

کەمێك ویژدان بەکار بێنە! بەردەوام سەرنج لەم "دە" دەستوورانە بدە و، نەکەی پەنجەی ئیعتیراز بۆ فەرموودە پیرۆزەکان ڕابکێشیت و، پاشان بۆ شتێك کە گومان لە دڵتدا دروست بکات سەبارەت بە پلە و پایەی عیصمەتی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە بیانووی ئەوەی کە پێت وابێت شتێك لە ڕیوایەتێکدا هەبێت پێچەوانەی واقیع و حەقیقەت بێت!

ئەم "دە" دەستوورە و بواری پیادەکردنیان وات لێ دەکەن کە لە پلەی یەکەمدا واز لە ئینکاری بهێنیت، ئنجا پاش ئەوەش پێت دەڵێن کە: ئەگەر هەر ناتەواوی و تەقسیرێکی ڕاستەقینە هەبێت ئەوا لە ئێمەدایە (واتە لە دەستوورەکاندا) و بە هیچ جۆرێك لە فەرموودە پیرۆزەکاندا نی‌یە. خۆ ئەگەر کەموکووڕیی ڕاستەقینە لەودا نەبوو، ئەوا لە تێ گەیشتنی خراپی خۆتدایە!

**پوخته‌ی ئه‌م قسانه:** هه‌ر كه‌سێك له‌ ئینكاری كردندا به‌رده‌وامه‌، ده‌بێ له‌ پێشدا ئه‌م "د" ده‌ستووره‌ ناوبراوانه‌ پووچه‌ڵ بكاته‌وه‌، ده‌نا توانای ئینكاری كردنی نی‌یه‌.

جا ئه‌گه‌ر به‌ ڕاستی خاوه‌نی ویژدانیت، ئه‌وا به‌ باشی سه‌رنج له‌م "ده‌" ده‌ستووره‌ بده‌. پاشان بۆ ئینكاریی هیچ فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ڕاست مه‌به‌ره‌وه‌ كه‌ ژیریی تۆ به‌ پێچه‌وانه‌ی حه‌قیقه‌تی ده‌بینێت. به‌ڵكو بڵێ: له‌وانه‌یه‌ پێویستی به‌ ته‌فسیرێك یان ته‌ئویلێك یان لێكدانه‌وه‌یه‌ك هه‌بێت، ئیتر بۆ خۆت واز له‌ ئیعتیراز گرتن بهێنه‌.

## ❑ ده‌ستووری یازده‌هه‌م:

هه‌روه‌ك قورئانی پیرۆز چه‌ندین ئایه‌تی موته‌شابیهی تێدایه‌ و پێویستیان به‌ ته‌ئویله‌، یاخود داخوازی ئه‌وه‌ن مرۆڤ به‌ شێوه‌یه‌كی ڕه‌ها وه‌ریان بگرێت.. به‌ هه‌مان جۆر فه‌رمووده‌ی پیرۆزیش چه‌ند حه‌دیسێكی موشكه‌لیان تێدایه‌، هه‌ندێ جار پێویستیان به‌ ته‌فسیر و لێكدانه‌وه‌ی ورد هه‌یه‌. ده‌توانیت له‌ نموونه‌كانی پێشوودا ئه‌مه‌ ببینیت.

به‌ڵێ، مرۆڤی بێدار ده‌توانێت خه‌ونی كه‌سێكی نوستوو لێك بداته‌وه‌، به‌ڵام ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ نوستووه‌ و گوێشی له‌ گوفتاری بێداره‌كانی ده‌وروبه‌ریه‌تی، هه‌ندێ جار قسه‌كانی ئه‌وان به‌ شێوه‌یه‌ك له‌ شێوه‌كان له‌ خه‌ونه‌كه‌یدا پیاده‌ ده‌كات و، به‌وه‌ی له‌گه‌ڵ خه‌ونه‌كه‌یدا بگونجێ لێكی ده‌داته‌وه‌.

ده‌سا ئه‌ی ئه‌و مرۆڤه‌ی كه‌ به‌ غه‌فله‌ت و فه‌لسه‌فه‌ی ماددی خه‌وی لێ خراوه‌!..

بێ ویژدان! ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ خوای گه‌وره‌ له‌ باره‌یه‌وه‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿مازاغ البَصَرُ وَما طَغى﴾ (النجم:١٧).. ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ له‌ باره‌ی خۆیه‌وه‌ ده‌فه‌رموێ: "تنام عيناي ولا ينام قلبي"[(١)] ئه‌و كه‌سه‌، بێداری ڕاسته‌قینه‌یه‌. كه‌واته‌ ئینكاری ئه‌و شتانه‌ مه‌كه‌ كه‌ ئه‌و ده‌یانبینێت. به‌ڵكو لێكی بده‌ره‌وه‌ و له‌ خه‌ونه‌كه‌تدا ته‌عبیرێكی بۆ په‌یدا بكه‌ و ته‌فسیرێكی بۆ بدۆزه‌ره‌وه‌. چونكه‌ ئه‌گه‌ر مێشووله‌یه‌ك به‌ كه‌سێكی نوستووه‌وه‌ بدات، ئه‌وا ئاسه‌واری ئه‌م پێوه‌دانه‌ی وه‌ها پێوه‌ ده‌رده‌كه‌وێ كه‌ ده‌ڵێی له‌ جه‌نگدا زامدار بووبێت! خۆ گه‌ر دوای بێداربوونه‌وه‌ی پرسیاری لێ بكرێ، ده‌ڵێت: به‌ڵێ، له‌ جه‌نگێكی خوێناویدا بووم و تۆپه‌كانم ئاراسته‌ كرابوون! له‌ كاتێكدا كه‌ بێداره‌كانی ده‌وروبه‌ری ئه‌م شڵه‌ژاوی‌یه‌ی ئه‌و به‌ پێكه‌نین و

---

(١) أخرجه أحمد (١٥١/٢، ٤٣٨) وإسناده حسن من أجل ابن عجلان. وأخرجه أيضاً ابن حبان (٢١٢٤). لكن للحديث شواهد يرتقي بها إلى درجة الصحة، منها ما أخرجه البخاري والنسائي من حديث عائشة رضي الله عنها، وشاهد آخر أخرجه البخاري من حديث أنس رضي الله عنه، وآخر من حديث ابن عباس رضي الله عنهما أخرجه احمد (٢٧٤/١٠) والترمذي (٥١٢١) وقال: حديث حسن صحيح غريب، وانظر المجمع (٢٤٢/٨) والطبقات لابن سعد (١٠٧/١). (وه‌رگێڕ – له‌ چاپه‌ عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌وه‌ هێناویه‌تی).

گاڵتە پێ کردنەوە وەردەگرن! کەواتە ڕوانینی غەفڵەتی خەولێخەر و بیری فەلسەفەی ماددی، هەرگیز ناگونجێ بکرێن بە مەحەك بۆ حەقیقەتەکانی نبووەت!

**❑ دەستووری دوازدەهەم:**

ڕوانینی "نبووەت" و "تەوحید" و "ئیمان".. لە نووری: ئولووهییەت و، ئاخیرەت و، یەکپارچەیی گەردووندا، ڕاستییەکان دەبینێت. چونکە ئەو ڕوانینەی ئەوان ئاراستەی ئەمانە کراوە. بەڵام "زانستی تەجریبی" و "فەلسەفەی نوێ" لە گۆشەی: "هۆکارە زۆرە ماددییەکان" و "سروشت"ەوە شتان دەبینێت، چونکە ڕووی لەمانەیە.

کەواتە ماوەی نێوان هەردوو گۆشەی ڕوانینەکان گەلێ لە یەکترەوە دوورە. لەوانەیە ئامانجێك هەبێت بەلای ئەهلی فەلسەفەوە گەلێ گەورە و گرنگ بێت، کەچی لە ناوەندی مەبەست و ئامانجەکانی زانایانی ئوصوولی دین و زانستی کەلامدا هێندە بێنرخ و نزم بێت کە لەوەدا بێت هەر نەبینرێت و تەنانەت بایەخیشی بۆ دانەنرێت. هەر لەبەر ئەمەشە کە زانایانی زانستی تەجریبی لە زانینی تایبەتکاری و زانیاریی دووردرێژ و وەسفە وردەکانی بوونەوەراندا گەلێ پێشکەوتن، کەچی لە بواری زانستی ڕاستەقینەدا، کە زانستە خواییە بەرزەکان و قیامەتییەکانن، گەلێ دواکەوتوون. تەنانەت لە سادەترین و کەم زانسترینی ئیماندارانیش بەجێ ماون!

جا ئەو کەسانەی کە ئەم نهێنییە نازانن، پێیان وایە زانایانی ئیسلام لە زانایانی سروشت و فەیلەسووفەکان دواکەوتوون. کەچی لە ڕاستیدا ئەوانەی کە ژیرییان خلیسکاوەتە چاوەکانیان و تەنها بیر لەو شتانە دەکەنەوە کە بە چاو دەیانبینن و، لە نێوان بوونەوەرانێکی زۆرو زەبەندەدا نوقم بوون، لە کوێ جورئەت و پڕکێشی ئەوەیان تێدایە بە میراتگرانی پێغەمبەران بگەنەوە کە بە مەبەست و ئامانجە خواییە بەرز و بڵندەکان گەیشتوون و پێیان بەهرەمەند بوون؟!

پاشان ئەگەر ڕوانین بۆ هەر شتێك لە دوو گۆشەی جیاوازەوە بێت، ئەوا بێ گومان دوو حەقیقەتی جیاجیا دەردەکەون، کە دەگونجێ هەردووکیان "حەقیقەت" بن. هەرگیزاو هەرگیزیش ڕاستییەکی زانستی و چەسپاوی بێ گومان لەگەڵ ڕاستییەکانی دەقە موقەددەسەکانی قورئاندا پێچەوانە دەرناچێت، چونکە دەستی کورتی زانستی تەجریبی هێندە کۆتایە ناگاتە داوێنی چمکێکی ڕاستییە بەرز و خاوێنەکانی قورئان. وا تەنها یەك نموونە لەسەر ئەمە دەهێنینەوە:

حەقیقەتی گۆی زەوی بەپێی بینینی "زانایان" ئەوەیە کە:

"زەوی" یەکێکە لە هەسارە گەڕۆکە قەبارە مامناوەندییەکان و، بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە و، لەچاو هەسارە و ئەستێرە لەژمارە بەدەرەکاندا تەنێکی بچووکی هەیە.

بەڵام گەر بە ڕوانینی "ئەهلی قورئـان" بڕوانینـە گـۆی زەوی ئـەوا حەقیقـەتی گـۆی زەوی بەو جۆرە دەبێت کە "وتەی پازدەهەم" ڕوونی کردووەتەوە:

ئـەو مرۆڤـەی کـە ناسـکترینی بـەری درەختـی جیـهان و، موعجیزەیـەکی جـامیعی نێـوان موعجیزەکانی خواوەندی بەتوانای دانایە و، ناوازەترین و ئازیزترین و نیانترینی بەدیهاتووانـە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەستەوسانترین و لاوازترینیشیانە.. ئەم مرۆڤە لەسەر گۆی ئەم زەوی‌یـەدا دەژی. کەواتـە "زەوی" لانکـی ئـەم مرۆڤەیـە و، هەرچـەند لـەچاو ئاسمانـەکاندا بچـووك و بێبایەخ دیارە، کـەچی لـەم ڕووەو و بەم نـاوەرۆك و ناوازەیی‌یـەی پلەیـەکی بـەرزی بەدەست هێناوە، تا وای لـێ هاتووە کە لە ڕوانگەی قورئانەوە "زەوی":

ناوجەرگە و مەڵبەندی گەردوونە لە واتا و ناوەرۆکدا و.. پیشانگای سەرجەم بەدیهاتووە دەراسـاکانە و.. جێـی تیادەرکـەوتنی سـەرجەم نـاوە جوانـەکانی خـواوەنـدە، بە ڕادەیـەك کـە دەڵێی تیشکۆیەکی کۆکەرەوەی ئەو نوورانیە و.. مەحشەر و ئاوێنەی کارە پەروەردگاری‌یە ڕەهاکانە و.. بازاڕێکی فراوانە بـۆ پێش‌چاوخستنی خەلاقییـەتی ڕەهـای خـوای گـەورە، بـە تایبـەت لـە بەدیـهێنانی ئەندازەیـەکی زۆر و زەبـەندەی ڕووەك و زینـدەوەرە وردەکـاندا، بـە کـەماڵی کـەرەم و دەسـتڕەنگینی و.. نموونەیـەکی بچـووك و پوختـی دروسـتکراوەکانی جیهانی فراوانی دواڕۆژە و.. کارگەیەکە، لەوپـەڕی خێراییدا، بـۆ بەرهـەم هێنـانی چـەندین چنین و تان و پۆی هەمیشـەیی کـار دەکـات و.. شـوێنی پێش‌چـاو خستنی نموونـەکانی دیمەنـە هەمیشەیی‌یەکانە کە زۆر بە پەلە ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت و.. کێڵگەیەکی تەسـکی کاتی‌یـە بۆ ڕواندنی ئەو وردیلە تۆوانـەی کـە بـە خێرایی بـۆ بـاخ و بێسـتانە ڕەنگینـە هەمیشـەیی‌یەکان پێ‌دەگەیەنرێن.

لەبەر هەموو ئەمانەیە کـە قورئـانی پیرۆز "زەوی" بـە هاوتـای "ئاسمانـەکان" دادەنێـت، لـە ڕووی مـەزنیی نـاوەرۆك و گرنگیـی بەدیهاتنیـەوە. وەك بڵێـی زەوی بـەرێکی بچووکـی درەختێکی گەورە و دڵێکی خنجیلانەی جەستەیەکی مەزن بێت. ئەوەتا قورئانی پیرۆز لەگەڵ ئاسمانەکاندا نـاوی دەبـات و، زەوی لـە تایـەکدا و ئاسمانـەکانیش لـە تایـەکی تـری تـەرازوودا دادەنێت و، هەردەم ئایەتی پیرۆزی: ﴿ربُّ السَّموات والأرض﴾ دووپات دەکاتەوە.

بەم جۆرە، مەسەلە و کێشەکانی تر لەسەر ئەم نموونەیە قیاس بکە و، تێ‌بگە کە:

ڕاستی‌یە سەرەونخون و مردووەکانی فەلسەفە هەرگیز نـاتوانن ڕێ لـە ڕاستـی‌یە ڕوونـاك و زیندووەکـانی قورئـان بگـرن و پێچەوانـەیان بـن. چونکـە هـەردووکیان حەقیقـەتن، بـەڵام جیاوازی لە گۆشەی ڕوانیندایە، بۆیە ڕاستی‌یەکانیش جۆراوجۆر دەردەچن.

# لقی چوارەم

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللهَ يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّموات وَمَنْ فِي الأَرضِ والشّمسُ والْقَمَرُ والنُّجُومُ والْجبالُ والشَّجَرُ والدَّوابُّ وكَثيرٌ مِنَ النّاسِ وكَثيرٌ حَقَّ عَليهِ العَذابُ وَمَنْ يُهِنِ اللهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ إنَّ اللهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾ (الحج:١٨)

وا لە خوارەوەدا تەنها یەك گەوهەری ناو گەنجینە مەزنە فراوانەكەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوون دەكەینەوە. چونكە:

قورئانی پیرۆز بە ڕاشكاوی ڕایدەگەیەنێت كە: هەموو شتێك هەر لە عەرشەوە تا زەوی و، لە مەلائیكەتەوە هەتا ماسیی ناو دەریاكان و، لە گەلەستێرەكانەوە هەتا مێرووەكان و، هەر لە هەسارە گەڕۆكەكانەوە تا دەگاتە گەردیلەكان.. یەك بە یەكی هەموویان، سوژدە بۆ خوای گەورە دەبەن و دەیپەرستن و تەحمید و تەقدیسی دەكەن. بەڵام پەرستشەكانیان جیاجیا و جۆراوجۆرە، هی هەر یەكەیان بەپێی توانا و لێهاتنیەتی و بە ئەندازەی گەیشتنیەتی بە درەوشانەوەكانی ناوە جوانەكانی خوای گەورە تیایدا.

لێرەدا جۆراوجۆری و جیاوازیی پەرستشی بوونەوەران بە نموونەیەك ڕوون دەكەینەوە:

بۆ نموونە (ولله المَثَلُ الأعلى): پادشایەكی مەزن و خاوەن توانا و دەسەڵات، چوار جۆر كرێكار لە بنیاتنانی كۆشكێك یان شارێكدا بەكار دەهێنێت:

**جۆری یەكەم**: بەندە و كۆیلەكانی خۆیەتی. ئەم جۆرەیان مووچە و پاداشتیان نییە، بەڵكو لەو كارانەدا كە بە فەرمانی گەورەكەیان جێبەجێی دەكەن ئەوپەڕی شەوقیان دەست دەكەوێت و چێژێكی لەوپەڕی ناسك و نیانیدا بەدەست دەهێنن، بگرە هەر گوفتارێك لە مەدح و وەسفی گەورەكەیاندا ببیستن پتر شەوق و چێژ و لەزەتیان پێ زیاد دەكات. ئەوان تەنها ئەو شەرەفمەندییە مەزنەیان سەروزیادە كە بەهۆی پەیوەندی و نیسبەتبوونیان لەگەڵ گەورەكەیاندا دەستیان دەكەوێت. ئەمە جگە لەو چێژ و لەزەتە مەعنەوییەش كە لە كاتی سەرپەرشتی كردنیاندا بۆ ئیش و كارەكان، بە ناوی خاوەنەكەیان و لە ژێر بینین و ڕوانینی و نە پێناویدا، دەیچێژن. كەواتە ئیتر پێویستیان بە مووچە و پلە و پاداشت نییە.

**بەشی دووهەم**: چەند خزمەتگوزارێكی سادە و ساویلكەن و نازانن بۆچی كار دەكەن، بەڵكو خاوەنە مەزنەكەیان – بە بیر و زانستی خۆی – دەیانخاتە كار و، پاداشتێكی جوزئی و گونجاویان پێ دەبەخشێت. جا ئەم خزمەتگوزارانە جۆری ئامانجە هەمەكی و بەرژەوەندییە

مه‌زنه‌كانی ئه‌نجامی كاره‌كه‌یان نازانن چی‌یه‌. ته‌نانه‌ت ئه‌مه‌ وای له‌ هه‌ندێ كه‌س كردووه‌ كه‌ له‌و وه‌همه‌دا بێت: كاری ئه‌م به‌شه‌ كرێكارانه‌ هیچ ئامانجێكی تێدا نه‌بێت، مه‌گه‌ر پاداشتێكی جوزئی كه‌ تایبه‌ته‌ به‌ خۆیانه‌وه‌.

**به‌شی سێهه‌م:** ئه‌و ئاژه‌ڵانه‌یه‌ كه‌ موڵكی ئه‌و ده‌سته‌ڵاتداره‌ مه‌زنه‌ن و، له‌ بنیاتنانی كۆشك و ته‌لار و شاره‌كه‌دا به‌ كاریان ده‌هێنێت و، جگه‌ له‌ ئالیك و ئاڵف چی‌تریان ناداتێ. جا ئه‌م ئاژه‌ڵانه‌ له‌ كاتی ئه‌نجامدانی ئه‌و كاره‌ی كه‌ له‌گه‌ڵ توانا و لێهاتنیاندا ده‌گونجێت، له‌زه‌ت له‌ كاره‌كه‌یان ده‌چێژن، چونكه‌ توانا و لێهاتن ئه‌گه‌ر له‌ دۆخی هێز(طور القـــوة)ه‌وه‌ ڕۆشته‌ دۆخی كردار(طور الفعل) ئه‌وا وه‌ك خونچه‌ ده‌پشكوێت و ده‌كرێته‌وه‌، ئه‌مه‌ش له‌زه‌ت به‌رهه‌م دێنێت. كه‌واته‌ ئه‌و له‌زه‌ته‌ی كه‌ له‌ هه‌موو كارایی‌یه‌كان(الفعالیات)دا هه‌یه‌، ته‌نها له‌م نهێنی‌یه‌وه‌ سه‌رچاوه‌ی گرتووه‌.

جا پاداشت و مووچه‌ی ئه‌م به‌شه‌ خزمه‌تگوزاره‌، بریتی‌یه‌ له‌: ئالیك، له‌گه‌ڵ چێژێكی مه‌عنه‌ویدا.. ئه‌م دوو پاداشته‌ سه‌روزیادیانه‌.

**به‌شی چواره‌م:** چه‌ند كرێكارێكن كه‌ ده‌زانن چ كارێك ئه‌نجام ده‌ده‌ن و بۆچی ده‌یكه‌ن و بۆ كێی ده‌كه‌ن، چ جای ئه‌وه‌ی كه‌ ده‌شزانن كرێكاره‌كانی تر له‌به‌ر چی كار ده‌كه‌ن و، ئه‌و خاوه‌ن ده‌سته‌ڵات و به‌توانا مه‌زنه‌ش ئامانجی له‌م كارانه‌دا چی‌یه‌ و بۆچی هه‌موویانی خستووه‌ته‌ كار..

ئه‌م جۆره‌ كرێكارانه‌، سه‌ركردایه‌تیی كرێكاره‌كانی تر و سه‌رپه‌رشتی كردنی ئه‌وانیان له‌ ئه‌ستۆدایه‌ و، به‌پێی پله‌ و پایه‌شیان مووچه‌ی خۆیانیان هه‌یه‌.

هه‌ر به‌ وێنه‌ی ئه‌م نموونه‌یه‌، خواوه‌ندی شكۆمه‌ندی خاوه‌نی ئاسمانه‌كان و زه‌وی و، خاوه‌ن جوانیی به‌دیهێنه‌ری دنیا و قیامه‌ت و، په‌روه‌ردگاری هه‌موو جیهانه‌كانیش، له‌ بازنه‌ی هۆكاره‌كان و له‌م كۆشكه‌ی گه‌ردووندا: مه‌لائیكه‌ت و ئاژه‌ڵ و بێ گیانه‌كان و ڕووه‌ك و مرۆڤ، ده‌خاته‌ كار و به‌ره‌و په‌رستش ده‌یانداته‌ به‌ر، بێ ئه‌وه‌ی كه‌ پێویستی به‌وان بێت. چونكه‌ ئه‌و خۆی "به‌دیهێنه‌ر"ه‌ و هه‌رگیز پێویستی به‌ هیچ شتێك نی‌یه‌. به‌ڵكو له‌به‌ر ده‌رخستنی عیززه‌ت و مه‌زنایه‌تیی خۆی و، كاروباره‌ په‌روه‌ردگاری‌یه‌كان و، حیكمه‌ته‌كانی تری هاوچه‌شنیان، ده‌یانخاته‌ كار..

به‌م پێ‌یه‌، ئه‌م چوار جۆره‌ كارگوزاره‌، چوار شێوه‌ی جیاجیای په‌رستنیان خراوه‌ته‌ ئه‌ستۆ:

**به‌شی یه‌كه‌م:** ئه‌وانه‌ن كه‌ له‌ نموونه‌كه‌دا به‌ به‌نده‌ و كۆیله‌ ناوبران و، لێره‌دا مه‌به‌ست پێیان مه‌لائیكه‌تانه‌، كه‌ له‌ ڕووی پله‌ به‌رزبوونه‌وه‌ی ئه‌نجامی "موجاهه‌ده‌"وه‌ پله‌یان به‌رز نابێته‌وه‌،

بەڵکو هەریەکەیان پلە و پایەیەکی چەسپاوی دیاری کراوی هەیە، بەڵام لە خودی کارەکەیاندا تامێکی تایبەتی دەچێژن و، هەریەکەیان بەپێی پلەی خۆی لە خودی پەرستشەکانیاندا ڕێژنە پەروەردگاریەکان وەردەگرن..

بەو واتایەی کە پاداشتی خزمەتەکانیان لە خودی کارەکانیاندایە، چونکە هەروەك مرۆڤ لەزەت لە: ئاو و هەوا و ڕووناکی و خۆراك دەبات، مەلائیکەتیش لەزەت و چێژ لە نوورەکانی: زیکر و تەسبیحات و حەمد و پەرستش و خواناسین و مەحەببەت، دەبەن و خۆراکیان لەسەر ئەوەیە. چونکە ئەوان لە "نوور" دروست کراون، کەواتە خۆراکی "نوور" سەروزیادیانە، تەنانەت ئەو بۆنە خۆشانەش کە لە "نوور"ەوە نزیکن، جۆرێکی تری خۆراکی ئەوانن. چونکە بەو بۆنە خۆشانە شاد و پێخۆشحاڵ دەبن.

بەڵێ، ڕۆحیانەتە خاوێنەکان حەزیان لە بۆنە خۆشەکانە!

پاشان "مەلائیکەت" لەو کارانەدا کە بە فەرمانی پەرستراوەکەیان دەیکەن و لە پێناوی ئەودا ئەنجامی دەدەن و.. لەو خزمەتانەدا کە بە ناوی ئەوەوە ڕایاندەپەڕێنن و.. لەو سەرپەرشتیکاری‌یەی کە لە ژێر بینین و چاودێریی ئەودا دەیکەن و.. لەو شەرەفمەندی‌یەشدا کە بەهۆی پەیوەندی‌بوونیان پێیەوە بە دەستی دەهێنن و.. لەو گەشت و گەڕانەی کە بە خوێندنەوە و موتاڵاکردنی جیهانی دیار و نادیاری ئەو دەیکەن و.. لەو نیعمەت و چێژەی کە بە بینینی درەوشانەوەکانی جوانی و شکۆمەندیی ئەو دەستیان دەکەوێت..

لە هەموو ئەمانەدا، مەلائیکەتەکان بەختەوەری‌یەکی هێندە مەزنیان دەست دەکەوێت کە ژیریی مرۆڤ پەیی پێ نابات و، جگە لە خودی مەلائیکەتەکە کەسی تر لە بەدیهاتووانی خوای گەورە پێی نازانێت!

جا بەشێك لە مەلائیکەتان تەنها لە عیبادەتدان و.. بەشێکی تریان عیبادەتەکانیان لە ئەنجامدانی کارەکانیاندایە و.. بەشی مەلائیکەتە کارگوزارەکانی ناو زەویش، وەکو "مرۆڤ" وان - گەر ئەم تەعبیرە دروست بێت - چونکە هەندێکیان ئەرکی سەرپەرشتی و چاودێریی ئاژەڵەکانیان لە ئەستۆدایە، کە مەلائیکەتە شوانەکانن و، جۆرێکی تریان سەرپەرشتیکاری ڕووەکەکانی زەوین کە جووتیارەکانیانن. بەو واتایەی کە ڕووی زەوی کێڵگەیەکی گشتی‌یە، مەلائیکەتێك سەرپەرشتیی دەکات کە کاری ئەو کێڵگەیەی لە ئەستۆ نراوە. واتە ئەو مەلائیکەتە بە فەرمان و ڕوخسەت و هێز و توانای بەدیهێنەری شکۆمەند و لە پێناوی ئەودا سەرپەرشتیی سەرجەم ڕەگەز و جۆرەکانی ئەو زیندەوەرانە دەکات کە بەسەر زەوی‌دا دێن و دەڕۆن. جگە لەم مەلائیکەتەش مەلائیکەتێکی بچووکتر هەیە کە چاودێریی تایبەتیی هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی زیندەوەرانی پێ سپێرراوە.

خۆ مادەم زەوی كێڵگەیە، ئەوا هەموو جۆرەكانی ڕووەكی تێدا دەچێنرێت. كەواتە مەلائیكەتێك هەیە بە ناوی خوای گەورە و بە هێز و دەستەڵاتی ئەو، سەرپەرشتیی گشت ڕووەكەكانی زەویی لە ئەستۆ نراوە. ئنجا مەلائیكەتێكی تر هەیە كە پلەی لەوی پێشوو لە خوارترە و سەرپەرشتیی یەك بە یەكی تاقم و چینە جیاجیاكانی ڕووەكەكان دەكات. بەم جۆرە، چەندەها مەلائیكەتی سەرپەرشتیكار هەن. ئنجا حەزرەتی میكائیلیش - دروودی لەسەر بێت - كە یەكێكە لە هەڵگرانی عەرشی "ڕەززاقییەت" سەرپەرشتیكاری هەرەمەزنە بەسەر هەموو ئەو مەلائیكەتانەوە.

ئەو مەلائیكەتانەی كە وەك شوان و جووتیار وان، لە مرۆڤ جیاوازن، چونكە ئەو سەرپەرشتی‌یەی بەسەر شتاندا دەیكەن كارێكی تەواو بێ گەرد و خاوێنە و لە پێناوی خواوەند و بە ناوی خوای گەورە و هێز و توانای فەرمانی ئەو، جێبەجێی دەكەن. تەنانەت سەرپەرشتی كردنەكەیان بریتی‌یە لە:

بینینی دەرەوشانەوەكانی پەروەردگاریێتی لەو "جۆر"ەدا كە سەرپەرشتی كردنی ئەویان لە ئەستۆ نراوە و..

خوێندنەوەی دەرەوشانەوەكانی توانست و میهرەبانی لەو كارەدا و..

گەیاندن و ئیلهام كردنی فەرمانەكانی خوا پێی و..

ئەنجامدانی ئەو كارەی كە وەك "ڕێكخستن" وایە لە كارە ئیختیاری‌یەكانیاندا، بە تایبەت لە سەرپەرشتی كردنی ڕووەكەكانی ناو كێڵگەی زەوی‌دا و..

نواندنی تەسبیحاتە مەعنەوی‌یەكانی ئەو "جۆر"ەی كە ئەوان سەرپەرشتیی دەكەن و، ئاشكرا كردنی "تەحیات" و سڵاوە مەعنەوی‌یەكانیان لە لای بەدیهێنەرە مەزنەكەیان، بە زمانی مەلائیكەت و..

پاشان جوانبەكارهێنانی ئەو ئامێر و كۆئەندامانەی كە بەو شتانە بەخشراون و ئاراستە كردنیان بۆ چەند ئامانجێكی دیاری كراو و ئەنجامدانی جۆرە ڕێكخستنێكی تایبەتی تیایاندا.

جا ئەم خزمەتگوزاری‌یانەی كە "مەلائیكەت" ئەنجامیان دەدەن، بە جۆرە دەستكەوتێكی "جوزئی ئیختیاری" دادەنرێت. تەنانەت جۆرێكە لە پەرستش و بەندایەتی‌یەكانیان. چونكە ئەوان دەست تێوەردان و دەستكاری كردنی ڕاستەقینەیان لە هیچ شتێكدا نی‌یە، ئەوەتا هەموو شتێك سكە و مۆرێكی تایبەتیی بەدیهێنەری هەموو شتانی لەسەر نەخشێنراوە، بە چەشنێك كە دەری دەخات: جگە لە خوای گەورە هیچ شتێك بە هیچ جۆرێك ناتوانێت خۆی لە بەدیهێنانی شتاندا هەڵبقورتێنێت.

واتە ئەم جۆرە كارەی مەلائیكەتان - لە ڕاستی‌دا - بریتی‌یە لە پەرستشەكانی ئەوان. چونكە كارەكانی ئەوان وەك هی مرۆڤ "عادەت" نین، بەڵكو "عیبادەت"ن.

**بەشی دووهەمی** کرێکارەکانی کۆشکی گەردوون: ئاژەڵەکانن.

جا لەبەر ئەوەی ئاژەڵەکان دەروونی خاوەن ئیشتیها و ئیختیاری جوزئی‌یان تێدایە، ئەوا کارەکانیان پاك و بێ گەرد نابێت بۆ خوای گەورە، بەڵکو "دەروون" بەش و هەوا و ئارەزووی خۆی لە کارەکەی‌دا دەوێت و ئەو بەشەی تێدا دەردەهێنێت. لەبەر ئەوە، خواوەندی خاوەن موڵك و کەرەم و شکۆمەندی، مووچە و پاداشتێك بەو ئاژەڵانە دەبەخشێت کە دەروونی ئەوانی پێ تێر و دڵنیا بکات.

بۆ نموونە: "بولبول" کە بە عاشقی گوڵ و شەیدای گوڵزارەکان ناسراوە[1] و زیندەوەرێکی بچووکە، بەدیهێنەری مەزن لە پێنج ئامانجدا بەکاری دەهێنێت:

*یەکەمیان*: ئەوەیە کە بەناوی هەموو تیرە و جۆرەکانی زیندەوەرانەوە ڕاگەیاندنی ئەو پەیوەندی‌یە بەتینەی لە ئەستۆ نراوە کە ئاژەڵەکان بەرامبەر جۆرەکانی ڕووەك هەیانە.

*دووهەمیان*: بریتی‌یە لەوەی کە بولبول کارمەندی ڕاگەیاندنی شادمانی و خۆشحاڵی و بەخێرهاتنە بەرامبەر بەو دیاری‌یانەی کە لە لایەن ڕۆزیدەری بەخشندەوە ڕەوانە کراون. چونکە "بولبول" وتاربێژێکی پەروەردگاری‌یە، بە خوێندن و نەوا و ئاوازەکانی داوای ڕۆزیی ئەو ئاژەڵانە دەکات کە پێویستیان بە ڕۆزی‌یە و میوانی خواوەندی میهرەبانن.

*سێ‌هەمیان*: دەرخستنی پێشوازیی جوان و شایستەیە بەرامبەر سەرجەمی ڕووەکەکان. واتە بۆ دەربڕینی پێشوازیی زیندەوەران لەو یارمەتی‌یانەی کە ڕووەك بۆ باڵندە و ئاژەڵەکانی هاوڕەگەزی ئەمی دەنێرن.

*چوارەمیان*: دەرخستن و ڕاگەیاندنی ئەو پێویستی‌یە توند و تیژەی ئاژەڵەکانە بە ڕووەکەکان کە دەگاتە ئاستی شەیدابوون بەرامبەر ڕوخسارە گەش و جوانەکانی ڕووەکەکان و، ڕاگەیاندنی ئەم پێویستی‌یەیە لە بەرچاوی بینەراندا.

*پێنجەمیان*: پێشکەش کردنی نەرمونیانترین تەسبیحاتە لە ناوەندی ناسکترین شەوق و تەسەمەندی و لە جوانترین ڕوودا (کە ڕووی گوڵە) بۆ دیوانی میهرەبانیی خواوەندی خاوەن موڵك و شکۆمەندی و بەخشندەیی.

جگە لەمانە، گەلێ واتای تریش هەن کە لەم پێنج ئامانجانە دەچن.

جا ئەم چەشنە واتا و ئامانجانەن کە ئامانج و مەبەستی ڕاستەقینەی ئەو کارەن کە "بولبول" لە پێناوی خواوەندی حەقدا ئەنجامی دەدات. کەواتە "بولبول" بە زمانی خۆی دەخوێنێت و

---

[1] لەبەر ئەوەی بولبول شاعیرانە دەخوێنێت، ئەوا ئەم باسەمان هەندێ گیانی شاعیریی ئاوێتە بووە، بەڵام ئەندێشە نی‌یە و هەمووی حەقیقەتە. (دانەر)

ئێمه‌ش له‌ ئاوازه‌ خه‌مناكه‌كانیه‌وه‌ ئه‌م واتایانه‌ تێ‌ده‌گه‌ین! هه‌روه‌ك مه‌لائیكه‌ت و رۆحانی‌یه‌كانیش لێی تێ‌ده‌گه‌ن. خۆ تێ‌نه‌گه‌یشتنی ته‌واوه‌تیی "بولبول" له‌ ئاوازه‌كانی خۆی، رێ له‌ تێگه‌یشتنی ئێمه‌ ناگرێت و زیانی لێ نادات. ئه‌وه‌تا وته‌ی: "رُبَّ مستمعٍ أوعى مِن متكلم"[1] په‌ندێكی به‌ناوبانگه‌. پاشان ئاگادارنه‌بوونی بولبول به‌ دوور و درێژی له‌م ئامانجانه‌، نابێت به‌ به‌ڵگه‌ له‌سه‌ر نه‌بوونیان، چونكه‌ بولبول هیچ نه‌بێ وه‌كو ئه‌و كاتژمێره‌ وایه‌ كه‌ كاته‌كانت پێ ده‌ناسێنێت، كه‌چی خۆی نازانێت چ كارێك به‌رێوه‌ ده‌بات. كه‌واته‌ "نه‌زانینی" ئه‌و زیان به‌ "زانینی" تۆ ناگه‌یه‌نێت!

جا مووچه‌ و پاداشتی ئه‌و "بولبول"ه‌، بریتی‌یه‌ له‌و چێژه‌ی كه‌ له‌ بینینی خه‌نده‌ی گوڵه‌ جوانه‌كانه‌وه‌ به‌ده‌ستی ده‌هێنێت و به‌ گفتوگۆكردنی له‌گه‌ڵیاندا ده‌یچێژێت. واته‌ ئاوازه‌ و ده‌نگه‌ ناسكه‌كانی "بولبول" سكالاَّ نین له‌ ده‌ست هیچ ئازارێك كه‌ هاتبێته‌ رێی زینده‌وه‌رێكی وه‌ك ئه‌و، به‌ڵكو پێشكه‌ش‌كردنی شوكر و سوپاسگوزاری‌یه‌ به‌رامبه‌ر به‌خششه‌ میهره‌بانی‌یه‌كانی خواوه‌ند.

زینده‌وه‌ره‌ ئاژه‌ڵه‌كانی تری وه‌ك "هه‌نگ" و "جاڵجاڵۆكه‌" و "مێروولـه‌" و وردیلـه‌ ئاژه‌ڵه‌كانی تر، وه‌كو "بولبول" قیاس بكه‌، چونكه‌ گه‌لێ ئامانجی زۆر له‌ ناوه‌ندی كاره‌كانی هه‌ریه‌كه‌یاندا هه‌یه‌ و، هه‌ریه‌كه‌شیان به‌ وێنه‌ی مووچه‌ و پاداشتێكی جوزئی چێژ و له‌زه‌تێكی تایبه‌تیی تێدا دانراوه‌، كه‌واته‌ هه‌ریه‌كه‌یان به‌و چێژ و زه‌وقه‌وه‌ خزمه‌تی ئامانجه‌ مه‌زنه‌كانی سنعه‌تێكی په‌روه‌ردگار ده‌كه‌ن. هه‌روه‌ك كرێكارێكی ئاسایی كه‌ له‌ناو كه‌شتیی پادشادا كار بكات مووچه‌ی جوزئیی خۆی هه‌یه‌، به‌ هه‌مان جۆر ئه‌م زینده‌وه‌رانه‌ش كه‌ خزمه‌تی كارگوزاری‌یه‌كانی خواوه‌ند ده‌كه‌ن، مووچه‌ی جوزئیی خۆیان هه‌یه‌.

**پاشماوه‌ی باسی بولبول:**

وا گومان نه‌بێت كه‌ ئه‌م كارمه‌ندی‌یه‌ په‌روه‌ردگاری‌یه‌ی له‌ "بولبول"دا بینیمان و، بریتی بوو له‌و راگه‌یاندن و رێنمایی و لاواندنه‌وانه‌ی كه‌ به‌ ئاوازی ته‌سبیحات ده‌ری‌بڕی، ته‌نها تایبه‌ت بێت به‌ "بولبول"ه‌وه‌. به‌ڵكو هه‌موو "جۆر"ێك له‌ زۆربه‌ی ره‌گه‌ز و جۆره‌كانی بوونه‌وه‌ران تاقمێكیان تێدایه‌ وه‌ك بولبول وان كه‌ دانه‌یه‌كی ناسك و نیانی ئه‌وان یاخود چه‌ند دانه‌یه‌كیان ناسكترینی هه‌ست و شعووره‌كانی ئه‌و ره‌گه‌ز و "جۆر"ه‌ ده‌نوێنن و، به‌ ناسكترین ئاواز سروودی نه‌رمونیانترین ته‌سبیحات ده‌خوێنن. به‌ تایبه‌ت جۆره‌كانی "مێروو" كه‌ گه‌لێ

---

(١) واته‌: جاری وا ده‌بێت هه‌ندێ له‌وانه‌ی كه‌ گوێیان له‌ قسه‌یه‌ك ده‌بێت له‌و كه‌سه‌ باشتر لێی تێ‌ده‌گه‌ن كه‌ قسه‌كه‌ی بۆ كردوون! (وه‌رگێڕ)

بولبـولی جۆراوجۆریـان هەیـە و خۆشـترین ئـاواز بـە گوێـی ئەوانـەدا دەدەن کـە گوێیـان لـێ ڕادەگرن و، بـە جوانـترین ئاوازیشـیان تەسبیحاتی خۆیـان بەسـەردا پـەخش دەکـەن، هـەر لـە بچووکترین زیندەوەرەوە تا گەورەترینیان.

هـەندێ لـەم بولبولانـە بولبـولی شـەون، کـە لـە شـەوگاری کـپ و ئـارام و لـە نـاوەندی بوونەوەرەکش و ماتەکاندا دەبـن بـە هـاوڕازی خۆشەویست و چیرۆکخوێنی دڵنەوای ئەو زیندەوەرە خنجیلە و بچووکانەی کە پاڵی ئارامی و هێمنی‌یان لێ داوەتەوە. بـە ڕادەیـەك کـە دەڵێی هەریەك لەو بولبولانە جەمسەری ئەڵقەیەکی پەنهانی زیکرە و، لە ناوەندی ئەو کۆڕەدا کە هەریەکەیان گۆشەی ئارامی و بێ‌دەنگیی گرتووە و بـەو دڵـە ئارامـەی کـە بـە بەدیهێنـەرە مەزنەکەی خۆی دڵنیایی بەدەست هێناوە، گوێ لە جۆرە زیکر و تەسبیحێکی خوای گەورە ڕادەگرێت!

جۆرێکـی تـری ئـەم بولبولانـە هـی ڕۆژن، کـە بـە ڕۆژی ڕۆشـنا و لەسـەر مینبـەری درەختـەکان و لـە بـەرچاوی بینـەراندا، بـە تایبـەت لـە وەرزی هـاوین و بـەهاردا سـۆز و میهرەبانیی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان بە خوێندن و سـروودەوە ڕادەگەیـەنن و، لـە ڕێـی خوێندن و ئاواز و جریوە ناسك و تەسبیحاتە سەرواداری(مسجع)ەکانیانەوە تاسە و ئـەوین لای هەموو گوێبیستێکیان دەوروژێنن، بە ڕادەیەك کە تەنانەت گوێبیستانیشیان هان دەدەن بـە زمان و ئاوازی تایبەتیی خۆیان دەست بە یاد و زیکری بەدیهێنەری مەزنیان بکەن!

بەو واتایـەی کـە هـەموو یـەکێك لـە جۆرەکـانی بوونـەوەران بولبولێکـی تایبـەتیی خۆیـان هەیە، کە سەر حەڵقەی زیکرە تایبەتی‌یەکەیانـە. تەنانـەت ئەستێرەکانی ئاسمـانیش بولبولێکـی تایبەتی‌یان هەیە کە بە "نوور" و "ڕووناکی‌یەکانی" دەخوێنێت و ئاوازەکانی پەخش دەکات.

بەڵام..

گـەورەترین و، بـەڕێزترین و، ڕووناکـترین و، مـەزنترین و، دەنـگ بـەرزترین و، خـاوەنی جوانترین سیفەت و تەواوترین زیکر و گشـتی‌ترین شـوکرانە و تـەواوترین ماهییـەت و، شێوە جوانترینی هەموو بولبولەکان، تەنها ئەو بولبولـەیە کە بە خوێنـدن و جریـوە ناسـك و لالانـەوە بەلـەزەت و تەسـبیحاتە بـەرز و بڵندەکـانی، تاسـە و جـەزبە و ئـەوینی لـە زەوی و ئاسمانـە بەرزەکان و لە باخچـەی ئـەم گەردوونـە مەزنـەدا هـەژاندووە.. کـە بولبـولی مـەزنی ڕەگـەزی مرۆڤـە لـە باخچـەی بوونـەوەراندا و بولبـولی قورئانـە بـۆ گـرۆی ئـادەمیزاد، کـە: حـەزرەتی محەممەدی ئەمینە!! عليه وعلى آله وأمثاله أفضل الصلوات وأجمل التسليمات!

**پوختەی ئەمانەی پێشوو:**

ئەو زیندەوەرە ئاژەڵانەی کە لە کۆشکی گەردووندا خزمەت دەکەن، بە تەواوی فەرمانە تەکوینی‌یەکان ڕادەپەڕێنن و بە ناوی خوای گەورەوە ئامانجەکانی ناو سروشتیان بە جوانترین شێوە دەردەخەن. کەواتە "تەسبیحات"ی ئەوان بریتی‌یە لە: ئەنجامدانی ئەرکەکانی ژیانیان - بە هێز و توانای خوای گەورە - لە ناوازەترین شێوەدا و، ماندووبوونیان لە کارەکانیاندا.. "پەرستشەکان"یشیان بریتین لەو دیاری و سڵاوانەی کە پێشکەشی بەدیهێنەری مەزن و بەخشندەی "ژیان"ی دەکەن.

**بەشی سێهەمی** کرێکارەکان: ڕووەك و بێ گیانەکانە.

ئەم کرێکارانە، نە مووچەیان هەیە نە پاداشت، چونکە خاوەنی "ئیختیار" نین. کەواتە کارەکانیان بە پاکی و بێ گەردی بۆ خوای گەورەیە و، تەنها بە ویست و هێز و توانا و ناوی خواوەند و لە پێناوی ئەودا ئەنجام دەدرێن. بەڵام لە بارودۆخی ڕووەکەکانەوە وا هەست دەکرێت کە لە دەمی ئەنجامدانی کاری: پیتاندن و، بەرهەمهێنان و، گەشەکردنی بەروبوومەکاندا، جۆرە لەزەتێك دەچێژن، بەڵام هەرگیز گرفتاری ئازار نابن. بە پێچەوانەی ئاژەڵەکانەوە کە لەزەت و ئازارەکانیان تێکەڵی یەکترین و، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خاوەنی هەندێك "ئیختیار"ن. جا لەبەر ئەوەی "ئیختیار" لە کاروباری ڕووەك و بێ گیانەکاندا خۆی هەڵناقورتێنێت، ئەوا ئاسەوارەکانی ئەم دوانە گەلێ ورد و تەواوتر دەردەچن لەچاو کاری ئەو ئاژەڵانەی کە خاوەنی "ئیختیار"ن! ئنجا لە زیندەوەرێکی - بۆ نموونە - وەك "هەنگ"دا کە بە وەحی و ئیلهام ڕووناکی بەدەست دەهێنێت، کارەکان وردتر و تەواوتر دەبن لە چاو کاری زیندەوەرێکی تر کە پشت بە "جوزئی ئیختیاری"ی خۆی دەبەستێت!

ئنجا هەموو دەستە و تاقمێکی ڕووەکەکانی ناو کێڵگەی زەوی، بە زمانی حاڵ و توانا و لێهاتنیان، لە بەدیهێنەرە داناکەیان دەپاڕێنەوە و، دەڵێن:

ئەی پەروەردگارمان! لە لایەن خۆتەوە هێزێکمان پێ ببەخشە تا بتوانین لە سەرتاسەری زەویدا ئاڵای دەستە و تاقمەکەمان دابکوتین، بۆ ئەوەی بە زمانی خۆمان "مەزنیی پەروەردگاریتی"یەکەت ڕابگەیەنین.. ئەی پەروەردگارمان! یارمەتیمان بدە بۆ ئەوەی لە هەموو گۆشەیەکی ئەم مزگەوتەی گۆی زەویدا تۆ بپەرستین و.. توانایەکمان بدەرێ کە بە ناو هەموو ناوچەیەکی ئەم پیشانگای زەوی‌یەدا گەشت و گوزار بکەین تاکو ناوبانگی نەخش و نیگاری ناوە جوانەکانت و ناوازەیی و لایەنە سەرسووڕهێنەرەکانی سنعەتی تۆ، بڵاو بکەینەوە.

بەدیهێنەری میهرەبانیش ئەم نزا مەعنەوی‌یەی ڕووەکەکان گیرا دەکات و، وردیلە باڵی وەك گەندەمووی ورد بە تۆوی تاقمێکیان دەبەخشێت تاکو بتوانێت بۆ هەموو شوێنێك بفرێت و، بەمەش کارێك دەکات کە هەرکەس دەیانبینێت ناوە جوانەکانی خوای گەورەیان لەسەر دەخوێنێتەوە. وەك ئەوەی کە لە زۆربەی ڕووەکە دڕکاوی‌یەکان و بەشێك لە تۆوی گوڵە زەردەکاندا دەبینرێت.. هەروەها خواوەند چنراوێکی تەڕ و پاراوی خاوێن بە هەندێکی تریان دەدات کە مرۆڤ پێویستیەتی و خۆشحاڵە پێی، تەنانەت مرۆڤ دەکاتە خزمەتگوزاریشی و لە هەموو شوێنێکدا دەیڕوێنێت.. هەندێکی تریشیان خواوەند شتێکیان پێ دەبەخشێت کە بە مرۆڤ هەرس(هضـم) ناکرێت و لە ئێسك دەچێت و شتێکی وەك گۆشتی بە بەر پۆشیوە و ئاژەڵەکان بۆیان دەخورێت و، خواوەند لە هەموو شوێنێکی زەوی‌دا بڵاویان دەکاتەوە.. هەروەها ئەو خواوەندە چەندین وردیلە دڕك بە هەندێکی تریان دەبەخشێت کە هەر هێندەی بەر شتێك بکەون پێوەی دەلکێن و، بەم جۆرە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەڕۆن و لەوێ ئاڵای دەستە و تاقمەکەیان هەڵدەکەن!

بەم جۆرە، "ڕووەکەکان" کارە ناوازەکانی سنعەتی خوای گەورە بڵاو دەکەنەوە و، بەشێکی تریان خواوەند چەند قوتوویەکی پڕ لە تۆویان پێ دەبەخشێت کە لە دەمی ڕەخسین و پێ‌گەیشتنیاندا بۆ ماوەی چەند مەترێك هەڵیاندەدات..

جا لەم نموونانەوە بزانە کە: چۆن "ڕووەکەکان" چەندین زمانی زۆر و زەبەندە بە زیکر و تەقدیسی "بەدیهێنەری مەزن" دەخەنە گوفتار، چونکە بەدیهێنەری دانا و زانا و بەتوانا هەموو شتێکی لە جوانترین شێوە و تەواوترین ڕێکی‌دا بەدی هێناوە و باشترین ئامێر و کۆئەندامی پێ‌بەخشیوە و بەرەو جوانترین ڕووکار ئاراستەی کردووە و لە جوانترین ئەرکدا خستوویەتیە کار. ئیتر ئەو شتەش باشترین و جوانترین تەسبیحات ئەنجام دەدات و، پەرستشەکانیشی بە باشترین شێوە ڕادەپەڕێنێت.

جا ئەگەر تۆی مرۆڤ بە ڕاستی مرۆڤیت ئەوا "سروشت" و "ڕێکەوت" و "بێ مەبەستی" و "گومڕایی" لەم شتە جوانانەدا هەڵمەقورتێنە و، بەم کارە ناشیرینەت جوانی‌یەکەی ئەوان مەشێوێنە، تاکو خۆیشت ناشیرین و شێواو دەرنەچیت!

**بەشی چوارەم:** "مرۆڤ"ە.

چونکە مرۆڤ، کە جۆرێکە لە خزمەتگوزارە کارمەندەکانی ئەم کۆشکەی گەردوون، لە ڕوویەکەوە لە "مەلائیکەت" دەچێت و لە ڕوویەکی تریشەوە لە "ئاژەڵ"! ئەوەتا لە ڕووی: پەرستشی هەمەکی و، گشتی‌بوونی سەرپەرشتی و، هەمەلایەنەی زانیاری و، لەوەشدا کە خەڵکی بۆ لای پەروەردگاریتیی مەزنی خوا بانگ دەکات، لە "مەلائیکەت" دەچێت.

ته‌نانه‌ت مرۆڤ گه‌لێ زیاتر له‌ مه‌لائیكه‌ت شتانی تێدا جه‌م بوون، چونكه‌ مرۆڤ به‌ پێچه‌وانه‌ی مه‌لائیكه‌ت ده‌روونێكی خراپكاری خاوه‌ن هه‌وا و ئاره‌زووی له‌ خۆدا هه‌ڵگرتووه‌ و، دوو ڕێگای له‌ به‌رده‌مدایه‌، ده‌بێ یان: به‌رزبوونه‌وه‌یه‌كی گه‌وره‌، یان: نزمبوونه‌وه‌یه‌كی سامناك بۆ خۆی هه‌ڵبژێرێت..

ئه‌و ڕووه‌ش كه‌ مرۆڤی تێدا له‌ "ئاژه‌ڵ" ده‌چێت، بریتی‌یه‌ له‌وه‌ی كه‌ مرۆڤ له‌ كاره‌كانی‌دا به‌ دوای به‌شی خۆی‌دا ده‌گه‌ڕێت!

كه‌واته‌ مرۆڤ دوو مووچه‌ی هه‌یه‌:

*یه‌كه‌م:* مووچه‌یه‌كی جوزئی و ئاژه‌ڵانه‌ و خێرایه‌.

*دووهه‌م:* مووچه‌یه‌كی هه‌مه‌كی و مه‌لائیكه‌ت‌ئاسا و دواخراوه‌.

له‌و بیست و سێ وتانه‌ی پێشوودا به‌شێكمان له‌: پاداشت و مووچه‌ و كارمه‌ندی و پله‌كانی به‌رزبوونه‌وه‌ و نزمبوونه‌وه‌ی "مرۆڤ" باس كردووه‌، به‌ تایبه‌ت له‌ وته‌ی یازده‌هه‌م و بیست و سێ‌هه‌مدا. چونكه‌ له‌و دووانه‌دا به‌ درێژی ئه‌وانه‌ ڕوون كراونه‌ته‌وه‌. له‌به‌ر ئه‌وه‌، لێره‌دا ئه‌م باسه‌ كورت ده‌كه‌ینه‌وه‌ و ده‌رگاكه‌ی پێ داده‌خه‌ین و، له‌ خوای گه‌وره‌ی به‌توانا ده‌پاڕێینه‌وه‌ كه‌: ده‌رگاكانی میهره‌بانیی خۆیمان بۆ بكاته‌وه‌ و، بۆ ته‌واوكردنی ئه‌م وته‌یه‌ یارمه‌تیمان بدات و، به‌ تكا و لالانه‌وه‌ش داوای لێ ده‌كه‌ین چاوپۆشی له‌ كرده‌وه‌ خراپه‌كانمان بكات و له‌ هه‌ڵه‌كانمان خۆش ببێت. ئامین.

## لقی پێنجه‌م

### ئه‌م لقه‌ پێنج "به‌ر"ی گرتووه‌

❑ **به‌ری یه‌كه‌م:**

ئه‌ی ئه‌و ده‌روونه‌م كه‌ خۆی خۆش ده‌وێت!

هه‌روه‌ها ئه‌ی ئه‌و هاوه‌ڵه‌شم كه‌ شه‌یدای دنیایه‌!

بزانن كه‌:

"خۆشه‌ویستی" هۆی په‌یدابوونی ئه‌م بوونه‌وه‌رانه‌یه‌ و، په‌یوه‌ندی‌ده‌ری نێوان به‌شه‌كانیه‌تی و، نوور و ژیانی سه‌رانسه‌ری گه‌ردوونه‌!

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی "مرۆڤ" گشتی‌ترین و هه‌مه‌كی‌ترینی به‌روبوومه‌كانی ئه‌م گه‌ردوونه‌یه‌، ئه‌وا خۆشه‌ویستی‌یه‌كی ئه‌وتۆ له‌ناو دڵی‌دا - كه‌ ناوكی ئه‌و به‌ره‌یه‌ - دانراوه‌ كه‌ بتوانێت

هەموو بوونەوەران بگرێتەوە. لەبەر ئەوە، مەگەر ئەو کەسەی خاوەنی کەماڵێکی نەبڕاوەیە، دەنا کەسی‌تر شایستەی ئەم چەشنە خۆش ویستنە بێ کۆتایی‌یە نی‌یە.

کەواتە ئەی نەفسەکەم و ئەی هاوڕێکەم!

خوای گەورە دوو ئامێری لە سروشتی مرۆڤدا داناوە، تاکو ببن بە هۆکاری "ترس" و "خۆشەویستی". جا ئەم ترس و خۆشەویستی‌یە یان روویان لە "خەڵکی" دەبێت یان لە "بەدیهێنەر". خۆ ئاشکرایشە کە ترسان لە "خەڵك" بەڵایەکی ئازاربەخشی بەسوێیە و، ئاراستە کردنی خۆشەویستیش بۆ ئەوان گیروگرفتێکی وەهایە کە ژیان لێڵ و بێتام دەکات. چونکە ئەم چەشنە ترسە ئەوە دەگەیەنێت کە تۆی مرۆڤ لە کەسێك دەترسیت بەزەیی پێتدا نایەتەوە، یاخود هەر گوێ لە سکاڵا و لاڵانەوەت ناگرێت! کەواتە "ترس" - لەم حاڵەتەدا - بەڵایەکی ئازاربەخشە.. ئنجا سەبارەت بە خۆش ویستنیشیانەوە، ئەوا ئەو شتەی کە تۆ خۆشت دەوێت، یان ناتناسێت و بەبێ خوا حافیزی بەجێت دەهێڵێت (وەکو سامان و لاویت) یان لەبەر ئەوەی تۆ خۆشت دەوێت، ئەو دەچێت بە چاوی سووکەوە سەیرت دەکات! ئایا نابینیت لە سەدا نەوەد و نۆی عاشقە مەجازی‌یەکان سکاڵا لە دەست مەعشووقەکانیان دەکەن؟! ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە: خۆش ویستنی چەند خۆشەویستێکی لەبت‌چووی دنیایی تا ڕادەی "پەرستن" بە ناخی ئەو "دڵ"ەی کە ئاوێنەی خواوەندی صەمەدە، بە لای ئەو خۆش ویستراوانەوە قورسە.. گرانە، چونکە سروشتی مرۆڤ دەست بە ڕووی هەموو ئەو شتانەوە دەنێت کە لەگەڵی‌دا ناگونجێن و شایانی نین! (دیارە خۆشەویستیی شەهوانی لە دەرەوەی ئەم باسەماندایە).

بەو واتایەی کە: ئەو شتانەی خۆشت دەوێن: یان ناتناسن، یان بە سووکی تەماشات دەکەن، یان هاوڕێیەتیت ناکەن، بەڵکو هەرچەندەش هاوار بکەیت و پێت ناخۆش بێت، ئەوان هەر دەڕۆن و بەجێت دەهێڵن!

جا مادەم وایە ئەوا ڕووی ئەم "ترس" و "خۆشەویستی"یەت ئاراستەی ئەو کەسە بکە کە ترسەکەت دەگۆڕێت بە زەبوونی‌یەکی بەلەزەت و، خۆشەویستی‌یەکەشت بە بەختەوەری‌یەکی دوور لە زەلیلی و ڕسوایی!

بەڵێ، ترسانی مرۆڤ لە بەدیهێنەری شکۆمەندی خۆی ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو مرۆڤە ڕێگایەکی بەرەو بەزەیی و میهرەبانیی خوای گەورەی دۆزیوەتەوە، تاکو لەو ڕێیەوە هانای بۆ لا ببات. کەواتە "ترس" لەم ڕووەوە قامچیی هاندان و تەشویقە، مرۆڤ بەرەو باوەشی سۆز و میهرەبانیی خواوەند دەداتە بەر. چونکە وەك ئاشکرایە "دایك" بۆ ئەوە منداڵەکەی دەترسێنێت تاکو بگەڕێتەوە بۆ لای و بە سنگی خۆیەوە بینووسێنێت! جا ئەم ترسە لە دڵی ئەو

ناڵه‌دا گه‌لێ به‌تام و له‌زه‌ته، چونكه ناڵه‌كه به‌ره‌و باوه‌شی سۆز و به‌زه‌یی ڕاده‌كێشێت. خۆ ده‌شزانین كه "شه‌فه‌قه‌تی هه‌موو دایكان" ته‌نها یه‌كێكه له بریسكانه‌وه‌كانی "میهره‌بانیی خواوه‌ند". به‌و واتایه‌ی كه ترسان له خوای گه‌وره، تام و له‌زه‌تێكی گه‌لێ مه‌زنی تێدایه. جا ئه‌گه‌ر "ترسان له خوای گه‌وره" تا ئه‌م ڕاده‌یه چێژ و له‌زه‌تی تێدا بێت، ده‌بێت "خۆش ویستنی" چۆن بێت؟! ئایا له‌مه‌وه ده‌رناكه‌وێت كه چه‌نده له‌زه‌تی نه‌بڕاوه‌ی تێدایه؟

پاشان ئه‌و كه‌سه‌ی كه له خوا ده‌ترسێت، له‌وه ڕزگاری ده‌بێت كه له كه‌سانی تر بترسێت، كه ترسێكی پڕ له دڵڕه‌قی و گیروگرفته..

ئنجا ئه‌و خۆشه‌ویستی‌یه‌ی كه مرۆڤ بۆ بوونه‌وه‌رانی ئاراسته ده‌كات، ئه‌گه‌ر له پێناوی خوای گه‌وره‌دا بێت، ئه‌وا ئازاری جودایی ئاوێته نابێت.

به‌ڵێ ڕاسته، مرۆڤ له پێش هه‌موو كه‌سێكدا خۆی خۆش ده‌وێت، ئنجا خزمانی و، پاشان نه‌ته‌وه‌كه‌ی و، دوای ئه‌وان بوونه‌وه‌ره زیندووه‌كان و، پاشان گشت بوونه‌وه‌ران و، ئنجا هه‌موو دنیای خۆش ده‌وێت. مرۆڤ په‌یوه‌ندیی له‌گه‌ڵ هه‌موو یه‌كێك له‌م بازنانه‌دا هه‌یه و، ده‌گونجێت به له‌زه‌ت چه‌شتنی ئه‌وان ئه‌میش له‌زه‌ت بچێژێت و به ئازاریشیان تووشی ئازار ببێت. خۆ هیچ شتێك له‌م جیهانه جه‌نجاڵه تێكه‌ڵوپێكه‌ڵ و پڕ له هه‌را و هوریایه‌دا وه‌ك خۆی نامێنێته‌وه و گه‌رده‌لوولی ڕووخێنه‌ر داری به‌سه‌ر به‌ردیه‌وه ناهێڵێت. بۆیه دڵی مرۆڤی هه‌ژار هه‌میشه زامی یه‌ك له‌دوای یه‌كی تێدا په‌یدا ده‌بێت..

ئه‌وه‌تا سه‌رجه‌می ئه‌و شتانه‌ی كه مرۆڤ ده‌ستی له داوێنیان گیر كردووه، ده‌ڕۆن و به‌م ڕۆشتنه‌شیان دڵی مرۆڤ زامدار ده‌كه‌ن، به‌ڵكو ده‌ستیشی ده‌بڕن! له‌به‌ر ئه‌وه، مرۆڤ هیچ كاتێك له ده‌ست دڵته‌نگی و نیگه‌رانیی به‌رده‌وام ڕزگاری نابێت. ته‌نانه‌ت هه‌ندێ جار له تاوا خۆی ده‌هاوێته باوه‌شی بێئاگایی و مه‌ستی‌یه‌وه!

كه‌واته ئه‌ی نه‌فسه‌كه‌م! ئه‌گه‌ر تۆ ژیر و خاوه‌نی فام و ئاوزانیت، ئه‌وا هه‌موو جۆره‌كانی "خۆشه‌ویستی" كۆ بكه‌ره‌وه و پێكه‌وه ئاراسته‌ی خاوه‌نه ڕاسته‌قینه‌كه‌یان بكه و، خۆت له‌م به‌ڵا و گیروگرفتانه قورتار بكه. چونكه ئه‌م هه‌موو جۆره خۆشه‌ویستی‌یه نه‌بڕاوانه – له ڕاستی‌دا – تایبه‌تن به خاوه‌نی جوانی و كه‌ماڵێكی بێ كۆتایی، جا هه‌ركات هه‌موویانت گێڕایه‌وه بۆ خاوه‌نه ڕاسته‌قینه‌كه‌یان، ئه‌وا ده‌توانیت، بێ هیچ دڵته‌نگی و مه‌راقێك، هه‌موو شتێكت به ناوی ئه‌و خاوه‌نه‌یانه‌وه و، له‌و ڕووه‌وه كه هه‌موویان ئاوێنه‌ی ئه‌ون، خۆش بوێت.

به‌و واتایه‌ی كه ده‌بێ ئه‌م خۆشه‌ویستی‌یه، ڕاسته‌وخۆ، ئاراسته‌ی بوونه‌وه‌ران نه‌كه‌یت. ده‌نا خۆشه‌ویستی‌یه‌كه‌ت هه‌ڵده‌گه‌ڕێته‌وه و له دۆخی "نیعمه‌ت" ده‌رده‌چێت و ده‌بێت به نه‌گبه‌تی و مایه‌ی ئازارێكی سه‌خت.

شتێكی تر ماوه، با باسی بكه‌م بۆت:

تـۆ ئـەی نەفسـەکەم! ڕووی خۆشەویستی‌یەکـەت ڕاسـتەوخۆ ئاراسـتەی "خـۆت" دەکـەیت و، کـارێکی وا ئـەنجام دەدەیـت کـە "نـەفس"ی خـۆت دەکـەیت بـە خۆشەویسـت، بەڵکو بە پەرستراوی خۆی و هەموو شـتێك لـە پێناوی‌دا بـەخت دەکـەیت. وەك بڵێـی جـۆرە پەروەردگارێتی‌یەکی پێ ڕەوا دەبینیت! لە کاتێکدا کە هۆکـاری خۆشەویستی: یـان کەمالـە (چونکە کەماڵ خۆی لە خۆی‌دا خۆشەویستە) یان بەرژەوەندی‌یە، یان لـەزەتە، یان فەزیلەتـە، یان هەر هۆکارێکی تری وەك ئەمانەیە کە دەبن بەهۆی سەرهەڵدانی خۆشەویستی.

ئێستاش ئەی نەفسەکەم!

لە چەند جێگایەکی وتەکاندا بە چەشنێکی بێ گومان چەسپاندوومانە کە: ماهییـەتی "تـۆ" هەویرێکـە لـە: قسـوور و، ناتـەواوی و، هـەژاری و، کۆڵـەواری، ئاوێتـە بـووە و پێکـەوە هەڵشێلراوە. جـا تۆ بـەپێی دژێتی(الضدیّة) ئـەرکی "ئاوێنە" ئەنجـــام دەدەیـت، ئەوەتـا بەو قسوور و ناتەواوی و هەژاری و کۆڵەواری‌یەی کـە هـەر لـە بناغـەدا لـەناو ماهییـەتی تۆدان، کـەماڵ و جوانـی و توانسـت و میـهرەبانیی بەدیهێنـەری مـەزن دەردەخـەیت، بـە وێنـەی "تاریکی"ی چڕ و نووتەك کە درەوشانەوە و بریسکانەوەی "ڕووناکی" دەردەخات!

کەواتە ئەی نەفسەکەم!

دەبێ نەفسی خۆت خۆش نـەوێت، بـەڵکو باشتر وایـە دوژمنایـەتیی بکـەیت، یـان – دوای ئەوەی کە دەبێت بە "مُطمئنّة" – بەزەییت بە حاڵی‌دا بێتەوە!

جا ئەگـەر نەفسـی خۆتـت لـەبەر ئـەوە خـۆش دەوێـت کـە مایـەی سـەرهەڵدانی لـەزەت و نیعمەتەکانە و، خۆیشت شەیدای تام و چێژی لـەزەت و بەرژەوەندی‌یـەکانیت، ئـەوا هـەرگیز لـەزەتێکی نەفسانیی بـە ئـەندازەی گەردیلەیـەك بەسـەر لـەزەت و بەرژەوەندی‌یـە نـەبڕاوە و لـە سنووربەدەرەکاندا پێش مەخـە و، وەکـو "گوڵەستێرە" مەبـە کـە گشـت شـتان و سـەرجەم خۆشەویسـتانی نوقمـی تـاریکی دەکـات و پێـی وایـە وردیلـە بریسـکانەوەکەی خـۆی سـەروزیادیانە. چونکـە لەزەتـە نەفسـانی و سـوود و بەرژەوەندی‌یـەکانت، هـەروەها ئـەو سـوودانەی کـە بـەهۆی سـوود و بـەرژەوەندیی ئەوانـەوە بەدەسـتیان دەهێنیـت و، ئـەو بەختەوەری‌یەش کە بە بەختەوەریی ئەوان هەستی پێ دەکەیت و، تەنانەت هەموو سوودەکانی گشت بوونەوەرانیش، تێکڕا هەموویان لە سۆز و لوتف و بەزەیی "خۆشەویستی ئەزەلی"یـەوە سەرچاوەیان گرتووە.

کەواتە دەبێ ئـەو "خۆشـەویستە ئـەزەلی"یـەت خـۆش بوێـت، تـاکو لـە ڕێـی بەختـەوەریی خـۆت و هـەموو ئەوانـەی بـاس کـران، لـە خـۆش ویستنی "کـەماڵی موتڵـەق"ی ئـەو، تـام و لەزەتێکی نەبڕاوە بچێژیت.

لە ڕاستیدا ئەو خۆشەویستییەی کە لە تۆدا جێگیر کراوە و خۆتت پێخۆش دەوێت. خۆش ویستنێکی زاتیی خوایە، تاکو ڕووی بکەیتە خواوەند و زاتی خوای گەورەت پێ خۆش بوێت، بەڵام تۆ بە هەڵە و خراپ بەکارت هێنا و ئاراستەی خودی خۆتت کرد!

کەواتە ئەی نەفسەکەم "أنـا"ی خۆت لەناوبەرە و "هُـوَ" دەربخە! چونکە هەرچی جۆرەکانی خۆشەویستیی ناو ناخت هەن، کە بەسەر بوونەوەراندا بڵاو کراونەتەوە، لە ڕاستیدا بۆ ئەوە پێت دراون کە بەرامبەر ناوە جوانەکانی خوا و سیفەتە مەزنەکانی بەکاریان بهێنیت، کەچی تۆ بە هەڵە و خراپی بەکارت هێنان. بێ گومان لەسەر ئەم کارەشت سزا دەدرێیت، چونکە تۆڵەی خۆشەویستییەکی نامەشرووع و نابەجێ، بەڵا و موسیبەتێکی وەهایە کە هیچ بەزەییەکی تێدا نەبێت.

جا ئەو خۆشەویستە ئەزەلییەی کە بە خواستی ناوی "الرحمن الرحيم"ی خۆی، خانە و لانەیەکی بۆ ئارەزووە ماددییەکانت ئامادە کردووە، کە بەهەشتێکە بە حۆری ڕازاندوویەتیەوە و، سەرجەم خواست و ئارەزووە ماددییەکانیشی تێدا کۆ کردووەتەوە و.. بە ناوە جوانەکانی تری گشت نیعمەت و بەخششە گشتییەکانیشی بۆ تێر کردنی خواستەکانی ڕۆح و دڵ و نهێنی و ژیری و لایەنە ناسکەکانی ترت، ئامادە کردووە.. تەنانەت هەموو یەکێك لە "ناوە جوانەکانی" چەندین گەنجینەی مەعنەوی و نەبڕاوەی چاکە و بەخششیان بۆ مرۆڤ ئامادە کردووە..

بێ هیچ گومانێك، کێشی یەك گەردیلە لە خۆش ویستنی ئەم خۆشەویستە ئەزەلییە، لە بریی سەرتاسەری بوونەوەران سەروزیادە و، هەرگیز ناکرێ و ناگونجێ کە سەرجەمی بوونەوەران جێی یەك درەوشانەوەی جوزئیی درەوشانەوەکانی خۆشەویستیی ئەو بگرنەوە!

کەواتە ئەی نەفسەکەم! گوێبیست و گوێڕایەڵی ئەم پەیمانە ئەزەلییە بە کە ئەو "خۆش ویستراوە ئەزەلییە" بەسەر زمانی خۆشەویستەکەیدا هێناویەتی و فەرموویە:

﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ (آل عمران:٣١)!

**□ بەری دووهەم:**

**ئەی نەفسەکەم!**

ئەرك و کارمەندییەکانی "بەندایەتی" پێشەکی نین بۆ پاداشتێکی داهاتوو، بەڵکو ئەنجامی نیعمەتێکی پێشووترن!

بەڵێ، ئێمە لە پێشەکیدا پاداشت و کرێی خۆمان وەرگرتووە و، بەو پێیە ئەرك و خزمەتی بەندایەتیمان کەوتووەتە ئەستۆ. چونکە:

تۆ – ئەی نەفسەکەم! – بەدیهێنەری شکۆمەند و بەخشندە پۆشاکی "بوون"ی بە بەر پۆشیویت، کە خێرێکی ڕووت و بێ گومانە و.. ئنجا بە خواستی ناوی "الرزاق"ی خۆیشی "گەدە"یەکی ئەوتۆی پێ داویت کە تامی هەموو ئەو خۆراکانە بچێژێت کە لەسەر سفرەی پڕ لە نیعمەتی ڕاخراوی بەردەمتدا دایناون.. پاشان "ژیان"ێکی خاوەن هەستیشی پێ بەخشیوویت، کە ژیانێکە کتومت وەك گەدە وایە، داوای ڕۆزیی خۆی دەکات، بۆیە سفرەیەکی فراوانی پڕ لە نیعمەتی بە ئەندازەی ڕووی زەویی لە بەردەم هەستەکانی "گوێ" و "چاو"تدا داناوە، کە وەکو "دەست" وان بۆ هەڵگرتنی ئەو نیعمەتانە.. پاشان "مرۆڤایەتی"شی پێ‌بەخشیوویت، خۆ دیارە ئەمەش داخوازی گەلێ ڕۆزیی مەعنەویەیە! لەبەر ئەوە، تا ئەو شوێنەی ژیری بڕ بکات سفرەی مولك و مەلەكووتی خۆی لە بەردەم گەدەی "مرۆڤایەتی"ی تۆدا والا کردووە.. پاشان "ئیسلام و ئیمان"ی پێ‌بەخشیوویت، کە بریتین لە: "مرۆڤایەتیی هەرە مەزن" و، خوازیاری گەلێ نیعمەتی بێ‌کۆتایین و، بە خۆراکی بەروبوومە نەبڕاوەکانی میهرەبانی دەژین. لەبەر ئەوە، لەناو بازنەی "مومکینات"دا سفرەی نیعمەت و بەختەوەری و لەزەتی گشتیی هەمەلایەنەی: "ناوە جوانەکان" و "سنعەتە پەروەردگاری"یە خاوێنەکانی لە بەردەمدا ڕاخستوویت.. پاشان "خۆشەویستی"ی پێ بەخشیوویت کە یەکێکە لە نوورەکانی ئیمان، بۆیە بە بەخشینی سفرەی: نیعمەت و، بەختەوەری و، لەزەتێکی نەبڕاوە، چاکەی لەگەڵدا نواندوویت.

واتە هەرچەند تۆ لە ڕووی "جەستە"ی بچووکتەوە: سنووردار و، پابەند و، زەلیل و کۆڵەوار و، لاوازیت، کەچی بەهۆی چاکەکاریی خوای گەورەوە، لە "جوزئی"یەوە بوویت بە "کوللی" و، لەویشەوە بوویت بە "کوللێکی نوورانی" چونکە هەرچەندە شتێکی جوزئی بوویت، کەچی بەرزی کردیتەوە و بەوەی کە ژیانی پێ دایت جۆرە هەمەکی‌بوونێکی پێ بەخشییت. پاشان بەوەش کە "مرۆڤایەتی"ی پێ بەخشیت، لە ڕاستی‌دا بۆ "هەمەکیی ڕاستەقینە" بەرزی کردیتەوە. ئنجا بە پێ‌بەخشینی نیعمەتی "ئیمان"یش کە چاکەیەکی خواوەندە بەسەرتەوە، بۆ پلەی بەرزی: "هەمەکیی نوورانی" و، لەویشەوە بە بەخشینی نیعمەتی: "ناسین و خۆش ویستنی خۆی" بۆ ناو نووری هەمەلایەنگیر و گشتی، بەرزی کردوویتەوە.

جا ئەی نەفسەکەم!

تۆ لە پێشەکی‌دا ئەم هەموو پاداشتانەت وەرگرتووە، ئنجا ئەرکی "بەندایەتی"ت خراوەتە ئەستۆ، کە خزمەتێکی بەلەزەت و گوێڕایەڵی‌یەکی تابلێی خۆشە، تەنانەت سووك و ئاسانیشە. ئایا هێشتا تۆ، دوای ئەوە، لە ئەنجامدانی ئەم ئەرکە خاوێن و مەزن و شەرەف بەخشەدا تەمبەڵی دەکەیت و، بە نازەوە دەڵێیت: "بۆچی دوعاکەم گیرا نابێت؟" تۆ هێندە بە

هەڵەدا چوویت کە ئەگەر بە جۆرێکی شڕ و وڕ ئەرك و خزمەتەکەی ئەستۆت ئەنجام بدەیت، دەچیت داوای "حەق" و "پاداشتی" گەورەتر دەکەیت! وەك بڵێی کرێکەی پێشووت بەشت نەکات و سەروزیادت نەبێت!

بەڵێ، دەبێ بزانیت کە تۆ هەرگیز مافی نازکردنت نییە، بەڵکو ئەرکی سەرشانت تەنها پاڕانەوەی گەرموگوڕ و لاڵانەوەی بە کوڵە لە دەرگانەی خواوەندا، چونکە خوای گەورە تەنها بە فەزڵ و چاکە و بەخشندەیی خۆیەتی کە "بەهەشت"ت پێ دەبەخشێت. کەواتە تۆش تەنها هانا بۆ لای میهرەبانییەکەی ئەو ببە و پشتی پێ ببەستە و، بەردەوام ئەو بانگەوازە پەروەردگارییە بەرز و بڵندە بڵێرەوە کە دەفەرموێ:

﴿قُلْ بِفَضْلِ اللهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ﴾ (يونس:٥٨).

ئەگەر دەشڵێیت:

چۆن دەتوانم بە شوکرانەبژێریی جوزئی و کەمی خۆم ئەرکی "شوکرانە" بەرامبەر بەو نیعمەتە هەمەکییانە دەرببڕم؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

بە "نییەت"ی گشتی و هەمەکی و، "باوەڕ"ی دامەزراوی بێسنوور..

بۆ نموونە: پیاوێك دەڕوات بۆ ناو دیوانی پادشا و، دیارییەکی موتەوازیعانە و هەرزانی "پێنج فلسی"ش لەگەڵ خۆیدا دەبات. کە دەگاتە ئەوێ دەبینێت ئەو دیارییانەی لە لایەن کەسانی پلە و پایە بەرزەوە بۆ پادشا نێرراون، هەموویان لەوێدا ڕیز کراون. ئەم پیاوە لەبەر خۆیەوە بە خۆی دەڵێت: چی بکەم؟ خۆ دیارییەکەی من لەچاو ئەوانەدا هەر هیچ نییە!! پاشان خێرا فریای خۆی دەکەوێت و ڕوو لە پادشا دەکات و دەڵێت:

- گەورەم! من هەموو ئەو دیارییانە بە ناوی خۆمەوە پێشکەش بە تۆ دەکەم.. تۆ شایانی هەموویانیت. ئەی پادشای گەورەم! خۆ من ئەگەر بمتوانیایە چەندەها ئەوەندەی وەك ئەم دیارییە بەنرخانەم پێشکەش بکردیتایە هەرگیز درێغیم نەدەکرد و بێ سێ و دوو کردن پێشکەشم دەکردیت.

پادشایش، کە هەرگیز پێویستی بە کەس نییە و، دیاریی ڕەعیەتەکانی وەك ڕەمزێك بۆ مەودای دڵسۆزی و ڕێز و گوێڕایەڵییان وەردەگرێت، دیارییە یەکجار موتەوازیعانەکەی ئەم هەژارەش - بەهۆی نیازە خاوێن و ڕاست و بێ گەرد و دڵنیاییە بەرز و جوانەکەیەوە - بە وێنەی دیارییە هەرەمەزنەکانی کەسانی تر، وەردەگرێت.

بە هەمان جۆر، بەندەی لاواز و کۆڵەواریش کە لە نوێژەکەیدا دەڵێت: "التحيات لله" ئەوا نییەتی بەم وتەیەی ئەوەیە کە:

(خوایە گیان! هەموو دیاریيەکانی بەندایەتیی بوونەوەران - کە بریتییە لـە ژیانیـان - بـە ناوی خۆمەوە پێشکەش بـە تۆ دەکـەم. خۆ مـن - ئـەی پـەروەردگارم! - ئەگـەر بمتوانیایـە بـە ئەندازەی ژمـارەی ئـەوان سـلاوم پێشـکەش بکردیتایـە، ئـەوا لێـی ڕانەدەوەستام و پێشکەشم دەکردیت، چونکە تۆ شایانی ئەوە و لەوەش زیاتریت).

جا ئەم "نیاز"ە خاوێن و "باوەڕ"بوونە ڕەگداکوتاوە، بە شوکرانەیەکی هەمەکی و فـراوان دادەنرێت.

با بۆ ئەمە نموونەیەك لە ڕووەکدا بهێنینەوە، چونکە ناوك و تۆوەکانیـان وەك نیـەتی ئـەوان وایە. بۆ نموونە "کاڵەك" بەو نییەتەی کە بە هەزاران دانە ناوکی ناو خۆی دەیهێنێت، دەڵێـت: ئـەی بەدیهێنـەرم! مـن پڕ بـە دڵـی خـۆم و بەوپـەڕی شـەوق و شـادیيەوە دەمـەوێت نـەخش و نیگارەکانی ناوە جوانەکانت لە سەرانسەری زەویدا ڕابگەیەنم.

جا لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەزانێت چی ڕوو دەدات و چۆنیش ڕوو دەدات، ئەوا ئـەو نییەتە ڕاست و خاوێنەی بە وێنەی پەرستنێکی فیعلی لـێ وەردەگرێت، وەك بلێـی بـە کـردەوە ڕووی داوە. ئـا لـێرەدا دەزانیـت کـە چـۆن "نییـەتی ئیمـاندار لـە کردەوەکەی باشترە" و، لـە حیکمـەتی ئـەو تەسبیحاتانەش تێدەگـەیت کـە بـە ژمـارە بێ کۆتاییيـەکان دەکرێـن، وەك: "سبحانك وبحمدك عدد خلقك ورضاء نفسك وزنة عرشك ومداد كلماتك"[1] و "نسبِّحُكَ بجميع تسبيحات أنبيائِك وأوليائِك وملائكتك".

جا هەروەك ئەفسەری بەرپرسیاری سەربازەکان، لە لای پادشا هەموو ئەو کارانە بە ناوی خۆیەوە پێشـکەش دەکـات کـە سـەربازەکانی ئـەنجامیان داوە.. ئـەم مرۆڤـەش کـە: ئەفسـەری سەرپەرشتیکاری بوونـەوەران و، پێشـەوای سـەربازی ڕووەك و ئاژەڵـەکانـە و، ئامـادەکراوی ئەوەیـە کـە ببێـت بـە خەلیفـە بەسـەر بوونـەوەرانی گـۆی زەویيـەوە، خـۆی بـە وەکیـل و بەرپرسیاری ئەو ڕووداوانە دەزانێت کە لە جیهانە تایبەتییەکەیدا ڕوو دەدات، ئەم مرۆڤـەش کە ئاوایە بە هەمان جۆرە، ئەوەتا بە ناوی هەموویانەوە دەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ بەمەش سەرجەم پەرستن و داواکاريیەکانی یارمەتیدان، کە بوونەوەران ئەنجامی دەدەن، ئەو بە ناوی هەموویانەوە پێشکەشی پەرستراوی شکۆمەندیان دەکات و، پاشان وا لـە سـەرجەمی بوونەوەرانیش دەکات کە بە ناوی ئەمەوە قسە بکەن و بدوێن، کاتێ کە دەڵێت: "سـبحانك بجميع تسبيحات جميع مخلوقاتك، وبألسنة جميع مصنوعـاتك". پاشـان بـە نـاوی هـەموو ئـەو

(١) حديث صحيح اخرجه احمد في المسند ٦/٣٢٥ و ٤٢٩ - ٤٣٠ ومسلم برقـم ٢٧٢٦ والـترمذي ٣٦٢٦ تحفة. وقال: هذا حديث حسن صحيح وأبو داود ٢٥٠٣ والنسائي ٤/٧٧ وابن ماجه. (وەرگێڕ)

شتانه‌ش كه له‌سه‌ر زه‌وی‌دا هه‌ن، سلاوات له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌دات و ده‌ڵێت: "اللّهم صلّ علی محمد بعدد ذرات الكائنات ومركباتـــها". چونكه هه‌موو شتێكی ناو ئه‌م گه‌ردوونه په‌یوه‌ندی‌یه‌كی له‌گه‌ڵ نووری محه‌ممه‌دی‌دا ﷺ هه‌یه. ئا به‌م جۆره له حیكمه‌تی ژماره نه‌بڕاوه‌كانی ته‌سبیحات و سلاواته‌كان تێبگه.

☐ **به‌ری سێهه‌م:**

ئه‌ی نه‌فسه‌كه‌م!

ئه‌گه‌ر به ڕاستی ده‌ته‌وێت له ته‌مه‌نێكی كورتدا كارێكی سه‌ربه‌دوارۆژی هه‌میشه‌یی‌یت ده‌ست بكه‌وێت؟.. ئه‌گه‌ر به ڕاستی ده‌ته‌وێت به وێنه‌ی ته‌مه‌نێكی درێژ سوود له هه‌موو خوله‌كێكی ژیانت ببینیت؟.. ئه‌گه‌ر به ڕاستی ده‌ته‌وێت "عاده‌ت" بگۆڕیت به "عیباده‌ت" و بێئاگاییشت بگۆڕیت به دڵنیایی و ئارامی.. ئه‌وا شوێن "سوننه‌تی پیرۆز"ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ بكه‌وه. چونكه جێبه‌جێ كردنی سوننه‌ت و شه‌رع له هه‌ر مامه‌ڵه و ڕه‌فتارێكدا دڵنیایی و ئارامی به‌رهه‌م ده‌هێنێت و، له‌به‌ر ئه‌وه‌ش كه چه‌ندین به‌روبوومی زۆری دوارۆژ ده‌گرێت، ئه‌وا وه‌ك جۆرێكی عیباده‌تی لێ دێت.

بۆ نموونه: ئه‌گه‌ر شتێكت كڕی، ئه‌وا له‌و ده‌م و ساته‌ی كه فه‌رمانی شه‌رعیی "ئیجاب و قبووڵ" جێبه‌جێ ده‌كه‌یت، هه‌موو كڕین و فرۆشتنه‌كه‌ت حوكمی عیباده‌ت وه‌رده‌گرێت! چونكه حوكمه شه‌رعی‌یه‌كه‌ت یاد ده‌خاته‌وه، كه ئه‌مه‌ش ته‌سه‌وورێكی ڕۆحیت پێ ده‌به‌خشێت و ئه‌م ته‌سه‌ووره‌ش شاریعی مه‌زنت یاد ده‌خاته‌وه كه خوای گه‌وره‌یه. واته ئه‌م مامه‌ڵه‌یه‌ی كه به‌م جۆره كرا، ڕووت وه‌رده‌چه‌رخێنێت به‌ره‌و خوای گه‌وره. هه‌ر ئه‌مه‌شه كه دڵنیایی و ئارامی ده‌ڕێژێته ناو دڵه‌وه.

واته كارئه‌نجامدان به‌پێی "سوننه‌تی پیرۆز" كرداره فانی و ته‌مه‌نه‌كورته‌كان ده‌كات به مایه‌ی ژیانێكی هه‌میشه‌یی و خاوه‌ن به‌روبوومی نه‌بڕاوه و هه‌تاهه‌تایی. له‌به‌ر ئه‌وه، به باشی گوێ له‌م فه‌رمایشته‌ی خوای گه‌وره ڕابگره كه ده‌فه‌رموێ: ﴿**فَآمِنُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللهِ وَكَلِماتِهِ واتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُون**﴾ (الأعراف:١٥٨) هه‌میشه تێبكۆشه كه ببیت به ده‌رخه‌ر و پیشانده‌رێكی گشتیی ڕێژنه‌ی دره‌وشانه‌وه‌یه‌كی هه‌موو ناوێك، له دره‌وشانه‌وه‌كانی ناوه جوانه‌كانی خوای گه‌وره، كه به ناو ئه‌حكامه‌كانی سوننه‌تی خاوێن و شه‌رعی پیرۆزدا بڵاو بوونه‌ته‌وه.

❑ بەری چوارەم:

ئەی نەفسەکەم! لاسایی ئەهلی دنیا مەکەرەوە، بە تایبەت کەسانی هەرزە و پیری کافران.. نەکەی بە ئارایشتە ڕواڵەتی و تام و چێژە لەخشتەبەرە نامەشرووعەکەی ئەوان بخەڵەتێیت! چونکە هەرگیز بە لاسایی کردنەوەیان وەکو ئەوانت لێ نایەت، بەڵکو بەرەو نزمی‌یەکی یەکجار نزم دەکەویتە خوارەوە، تەنانەت بە ئاستی نزمی پلەی ئاژەڵیشەوە ڕاناوەستیت و پتر بەرەوخوار دەبیتەوە! چونکە تۆ "ژیری"ت لەسەردایە، خۆ ئەم ژیری‌یەش بۆ تۆ دەبێتە ئامێرێکی بێزارکەری شووم و، چەکوشەکانی خۆیت بەسەردا دەسرەوێنێت!

چونکە:

ئەگەر کۆشکێکی مەزن گڵۆپێکی کارەبایی یەکجار گەورەی تێدا بێت و لەو گڵۆپەوە هێزی کارەبا بۆ گڵۆپە بچووکەکانی ناو ژوور و مەنزڵە بچووکەکان ڕاکێشرابێت و هەموو ئەو گڵۆپە بچووکانەش پەیوەندی‌یان بە گڵۆپە سەرەکی‌یەکەوە هەبێت، ئەوا ئەگەر کەسێك گڵۆپە کارەبایی‌یە گەورەکە بکوژێنێتەوە، یەکسەر تاریکی سەرجەمی ژوور و مەنزڵەکانی تریش دەگرێتەوە و گڵۆپەکانی ئەوێش دەکوژێنەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی چەندین گڵۆپی کارەبایی لە چەند کۆشکێکی تردا هەن کە بەو گڵۆپە مەزنەی کۆشکە گەورەکەوە پەیوەست نین، ئەوا گەر خاوەنی کۆشکەکە ئەو گڵۆپە مەزنە بکوژێنێتەوە هەر هێشتا چەندین گڵۆپی بچووکی تر لە کۆشکەکانی تردا دادەگیرسێن و ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکەن و دز و جەردەکان ناتوانن هیچ شتێکی ناو ئەو کۆشکانە بە دزی و تاڵانی ببەن.

جا ئەی نەفسەکەم!

کۆشکی یەکەم: مرۆڤی موسڵمانە.. گڵۆپە مەزنەکەش: سەردارمان پێغەمبەری خۆشەویستە ﷺ لە دڵی ئەو موسڵمانەدا. جا ئەگەر خوانەخواستە ئەو ئیماندارە پێغەمبەری لە بیر بچێتەوە و ئیمان لە دڵی خۆی‌دا دەربکات، ئەوا ئیتر باوەڕ بە هیچ پێغەمبەرێکی تر ناکات. تەنانەت هیچ جێگایەك لەناو ڕۆحی‌دا بۆ جێگیر کردنی کەماڵات نامێنێتەوە، بەڵکو پەروەردگاری مەزنیشی لە بیر دەچێتەوە و، تاریکیی ناو دەروونی هەموو ئەو مەنزڵگا و لایەنە نیان و ناسکانەش دەگرێتەوە کە لە ماهییەتی‌دا دانراون و، کاولکاری‌یەکی سامناك لە دڵی‌دا بەرپا دەبێت و، بێزاری و دڵتەنگیی بەسەردا زاڵ دەبێت.

جا ئایا چ شتێك فریای ئەو کاولکاری‌یە سامناکە دەکەوێت و، ئەم مرۆڤە چ سوودێکی دەست دەکەوێت تا بتوانێت ئەو کاولکاری و بێزاری‌یە ئاوەدان بکاتەوە؟!

بەڵام کەسانی "بیانی" وەك کۆشکی دووهەم وان، چونکە ئەگەر نووری پێغەمبەر ﷺ نە دڵیان دەربکەن، ئەوا چەند ڕووناکی‌یەك سەبارەت بەوان هێشتا هەر دەمێنێت، یان هیچ نەبێ پێیان وایە کە دەمێنێت! چونکە هێشتا لەو حاڵەشدا شتێکیان لە بارەی باوەڕ بە خوا و حەزرەتی مووسا و عیسا - درووودیان لەسەر بێت - لەلا دەمێنێت، کە دەبێتە تەوەرەی کەماڵی خووڕەوشتەکانیان.

ئەی نەفسی هاندەری خراپکاریم! ئەگەر دەڵێیت: من نامەوێت وەکو "بیانی‌یەکان" بم، بەڵکو دەمەوێت وەك "ئاژەڵ" بژیم! ئەوا - ئەی نەفسەکەم! - چەندین جار بۆمان دووپات کردیتەوە کە ناتوانیت تەنانەت وەك ئاژەڵیش بژیت! چونکە خاوەنی "ژیری"یت. خۆ ئەم ژیری‌یەی کە ئازارەکانی ڕابوردوو هاودەم لەگەڵ مەترسی‌یەکانی داهاتوودا کۆ دەکاتەوە. هەمیشە زللە بە ئازارەکانی خۆی دەسرەوێنێتە "سەر" و "چاو"ت و، لە ناوەندی چێژی یەك لەزەتدا هەزاران ئازارت دەرخوارد دەدات! کەچی ئاژەڵ وا نی‌یە، هەمیشە لەزەتی بێ‌ئازار دەچێژێت. جا ئەگەر دەتەوێت وەك "ئاژەڵ" وابیت ئەوا پێش هەموو شتێك واز لە "ژیری"ت بهێنە و تا چەندە هێزت تێدایە بەرەو دوور فڕێی بدە و خۆت بخەرە بەر زللەی تەمێ‌کردنی ئەم ئایەتە پیرۆزەی کە دەفەرموێ:

﴿كالأنعامِ بَلْ هُم أَضَلّ﴾ (الاعراف:١٧٩)!

**❑ بەری پێنجەم:**

ئەی نەفسەکەم!

چەندین جار دووپاتمان کردەوە کە: مرۆڤ بەری درەختی بەدیهاتووانە. کەواتە "مرۆڤ" وەکو "بەر" وایە، دوورترین شتی درەختەکەیە لە تۆوەکەیەوە و، لە هەمووشیان زیاتر تایبەتکاری‌یەکانی هەموانی تێدا جەم بووە و، بە ڕوانینێکی گشتی چاوی لە هەموویانە و، ڕووی "یەکبوون"ی هەموو درەختەکەی لەخۆ گرتووە. کەواتە مرۆڤ بەدیهاتوویەکە هەڵگری ناوکی "دڵ"ە و، ڕوویشی لە زۆر و زەبەندەیی بەدیهاتووەکان و، نەمان و، دنیایە. بەڵام "پەرستن" کە پەتی پەیوەندی و خاڵی پەیوەستی نێوان سەرەتا و کۆتایی‌یە، ڕووی مرۆڤ لە "نەمان"ەوە بۆ "مان" و لە "خەڵك"ەوە بۆ "حەق" و لە "زۆری"یەوە بۆ "وەحدانییەت" و، لە "کۆتایی"یەوە بۆ "سەرەتا" وەردەچەرخێنێت.

گەر "بەر"ێکی بەنرخی "خاوەن هەست" هەبێت و نزیك بێت تۆوەکانی پێبگەن، گەر لەم کاتەدا شانازی بە جوانیی خۆیەوە بکات و بۆ گیانلەبەرەکانی خوارووی خۆی بڕوانێت و خۆی بهاوێتە بەردەستیان، یان لە بێئاگاییدا بکەوێتە خوارەوە، ئەوا بێ گومان لەناو دەستی ئەواندا ورد و خاش دەبێت و، وەك هەر بەرێکی ئاسایی دەڕزێت و بەزایە دەچێت. بەڵام گەر ئەو بەرەی کە وامان دانا خاوەن هەست بێت، "خاڵی پشت پێبەستن"ی خۆی دۆزییەوە و، توانیی بیر بکاتەوە لەوەی کە لە ئەنجامدا دەبێت بە هۆکاری مانەوەی درەختەکە و دەرخستنی حەقیقەتەکەی و مایەی هێشتنەوە و بەردەوامیی ئەو درەختە لەو لایەنەوە کە ڕووی یەکبوونی درەختەکەی لە خۆدا حەشار داوە، ئەوا هەموو یەکێك لە تۆوەکانی ئەو تەنها بەرە، لە ناوەندی تەمەنێکی باقی و بەردەوامدا، حەقیقەتێکی کوللی بەدەست دەهێنێت.

جا ئەو مرۆڤەش کە لە ناوەندی بەدیهاتووە زۆر و زەبەندەکاندا ڕێی لێ ون بووە و، نوقمی ناو بەدیهاتووان بووە و، خۆش ویستنی دنیا هێندە بەسەر دڵیدا زاڵە کە خەندەی سەر لێوی بوونەوەرە فانییەکان لە خشتەیان بردووە و پێیان خەڵەتاوە و خۆی هاویشتووەتە باوەشیان، بێ هیچ گومانێك ئەم مرۆڤە، زیانێکی گەلێ گەورە دەکات، چونکە دەکەوێتە ناوەندی گومڕایی و تیاچوون و نەمانەوە. واتە لە ناوەرۆکدا خۆی ئیعدام دەکات و لەناوی دەبات.

بەڵام گەر ئەم مرۆڤە سەری بەرز بکاتەوە و، بە دڵێکی وریا و بێدارەوە گوێ لە دەرسەکانی ئیمان ڕابگرێت کە لەسەر زمانی قورئانی پیرۆزەوە دەوترێنەوە و، ڕوو بکاتە "وەحدانییەت"، ئەوا دەتوانێت بە میعراجی "عیبادەت" بۆ عەرشی کەمالات و ڕەوشت و خووی بەرز سەربکەوێت و، ببێت بە مرۆڤێکی تیانەچووی باقی.

دەسا ئەی نەفسەکەم! مادەم ڕاستی ئەمەیە و، تۆش لەسەر ئایین و میللەتی حەزرەتی ئیبراهیمیت - دروودی لەسەر بێت - ئەوا تۆش وەك ئیبراهیمی سەروەرمان بڵێ: ﴿**لا أُحِبُّ الآفلين**﴾ و، ڕوو لە خۆشەویستی باقی بکە و، وەك من بگری و بڵێ:

(شیعرە فارسییەکان لێرەدا نەنووسران، چونکە لە مەقامی دووهەمی وتەی حەڤدەهەمدا نووسراون).

# وتەی بیست و پێنجەم

## پەیامی موعجیزاتی قورئانی

مادەم موعجیزەیەکی هەمیشەیی وەك قورئانمان بە دەستەوەیە، ئەوا گەران بە دوای بەڵگەدا کارێکی زیاد لە پێویستە! ئایا وا دەزانیت لە دەمکوت کردنی کەسانی مونکیردا پەکم دەکەوێت، لە کاتێکدا کە قورئانمان بەدەستەوەیە کە هەر خۆیشی بەڵگەی حەقیقەتە؟!

**بێدارکردنەوەیەك**

**(لە سەرەتای دانانی ئەم وتەیەدا نیازمان وابوو پێنج "رۆشنایی"(شعلة) بنووسین. بەڵام لە کۆتایی رۆشنایی یەکەمدا – واتە دوو مانگ پێش دانانی پیتە تازەکان[1] – ناچاری پەلەکردن بووین لە نووسینی‌دا، تاکو ئەم پەیامە بە پیتە کۆنەکان چاپ بکەین. تەنانەت هەندێ لەو رۆژانە بیست یان سی لاپەڕەمان لە ماوەی دوو سێ سەعاتدا دەنووسی! لەبەر ئەوە، تەنها سێ "رۆشنایی"مان بە کورتی و پوختی نووسی و، وازمان لە دوانەکەی تر هێنا.**

**هیوادارم کە برا بەڕێزەکانم بە چاوی ویژدان و چاوپۆشی‌یەوە بڕواننە قسوور و ناتەواوی و گرفت و هەڵەکانم).**

---

(١) ئەم ڕستەیە زیادکردنی دانەر خۆیەتی لە نوسخەیەکی دەستنووسدا و، کاتی دانانی ئەم پەیامە دەستنیشان دەکات. چونکە بڕیاری بەکارهێنانی پیتی لاتینی و قەدەغەکردنی پیتە ئیسلامی‌یەکان لە تورکیادا لە بەرواری ١٩٢٨/١١/٢٣زدا بووە. (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە).

هەموو یەکێك لەو ئایەتە پیرۆزانەی قورئان کە لەم پەیامی "موعجیزاتی قورئانی"یەدا هێنراون، یان ئەوەیە لە لایەن مولحیدانەوە ڕەخنەیان ئاراستە کراوە.. یان لە لایەن ئەهلی زانستە نوێیەکانەوە ئیعتیرازیان لێ گیراوە.. یاخود دەستی شوبهە و گومانی شەیتانەکانی جیننی و ئینسیان بەرکەوتووە.

جا ئەم وتەی بیست و پێنجەمە هەموو ئەو ئایەتانەی هێناوە و، بە جوانترین شێوە و باشترین ڕوو، حەقیقەتەکان و سەرنج و لایەنە وردەکانی ڕوون کردوونەتەوە، بە ڕادەیەك کە ئەو شتانەی ئەهلی ئیلحاد بە خاڵی لاوازی و مایەی ناتەواوییان دادەنا، ئەم پەیامە بە دەستوورە زانستییەکانی خۆی چەسپاندوویەتی کە هەموو یەکێك لەوانە بریتین لە بریسکانەوەی ئیعجاز و سەرچاوەی کەماڵی ڕەوانبێژیی قورئان!

هەرچی گومانەکانیشە ئەوا وەڵامی بەهێز و گومانبڕیان لە بەرامبەرەوە دراوەتەوە، بێ ئەوەی بە ڕاشکاوی ناوی گومانەکە بهێنرێت، تاکو بە ناوهێنانی، زەینەکان لێڵ نەبن، وەك ئەوەی لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿والشَّمْسُ تَجري﴾ و ﴿والجِبالَ أَوتــــاداً﴾دا بەرچاو دەکەوێت. مەگەر ئەو گومانەی کە سەبارەت بە چەند ئایەتێك دەریانبڕیوە و، لە مەقامی یەکەمی وتەی بیستەمدا باسمان کردوون.

پاشان ئەم پەیامی "موعجیزاتی قورئانی"یە هەرچەند زۆر بە پوختی و بەوپەڕی خێرایی نووسراوە، بەڵام لایەنی ڕەوانبێژی و زانستەکانی زمانی عەرەبیی هێندە بە تێر و پڕی و بە شێوازێکی زانستییانەی ڕەسەن و قووڵ دەرخستووە کە زانایان تووشی سەرسووڕمان دەکات.

ئنجا هەرچەند هەموو ئەو کەسانەی کە بایەخ بەم پەیامە دەدەن، بە تێروتەسەلی لە گشت باسەکانی ناگەن و سوودی تەواوەتیی لێ نابەن، بەڵام هەموو یەکێکی ئەوان بەرچنیی بەشی گرنگی خۆی لەو باخچە ڕەنگین و خەملاوە دەکات.

ئنجا سەرباری ئەوەی کە ئەم پەیامە لە چەند بارودۆخێکی نائارامدا و بە پەلە نووسراوە و، لە سوودگەیاندن و دەربڕینی مەبەستەکانیدا قسوور و ناتەواویی پێوە دیارە، کەچی لە ڕوانگەی زانستەوە، ڕاستی و حەقیقەتەکانی گەلێ مەسەلە و بابەتی گرنگی ڕوون کردووەتەوە.

# پەیامی موعجیزاتی قورئانی

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿قُلْ لَئِن اجْتَمَعَتِ الإِنْسُ والْجِنُّ علَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هذا القُرْآنِ لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظهيراً﴾ (الإسراء:٨٨)

**لە نامیلکە عەرەبی‌یەکانم و، پەیامە عەرەبی‌یەکانی نـــوور و، تەفســیرەکەمدا کە نـــاوی: "إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز"ە و لـە بیســـت و چوار وتـــەکانی پێشووشدا، ئاماژەمان بۆ نزیکەی چل ڕووی ئیعجازی نێوان ڕووە ئیعجازی‌یە لـە سنووربەدەرەکانی قورئانی حەکیم کردووە. لەم پەیامەشدا ئاماژە بۆ پێـــج دانـە لـــەو ڕووە ئیعجـازی‌یانە دەکەین و هـەندێ بە درێـــژی لێـــان دەدوێـــین و، بـە پوختی‌و کورتی ڕووەکانی تریشیان لەگەڵدا تێهەڵکێش دەکەین.**

**وا لـە پێشەکی‌دا ئاماژە بۆ پێناسە و ماهیـەتی قورئانی پیرۆز دەکەین.**

## پێشەکی

"کە لە سێ بەش پێکهاتووە"

***بەشی یەکەم:***

"قورئان" چی‌یە و، پێناسەکەی چۆنە؟

لە "وتەی نۆزدەهەم"دا ڕوون کراوەتەوە و لە چەند پەیامێکی تریشدا چەسپێنراوە کە:

قورئان: سەرگوزەشتەی ئـەزەلیی کتێبی مـەزنی گـەردوون و.. تـەرجومانی ئەبـەدیی ئـەو زمانـە جۆراوجۆرانـەی بوونەوەرانـە کـە ئایەتـە تەکوینی‌یـەکان دەخوێننـەوە و.. موفەسسـیری کتێبی هەردوو جیهانی پەنـهان و ئاشـکرایە و... دەرخـەر و پیشـاندەری گەنجینـە مەعنـەوی و پەنهانـەکانی ئـەو ناوانـەی خواوەنـدە کـە لـــە توێـــی لاپـــەڕەکانی ئاسمانـــەکان و زەوی‌دا شـارراونەتەوە و.. کلیلێکـە بـۆ کردنـەوەی ڕاستی‌یەکانی ئـەو کاروبارانـەی کـە لـە نـاوەند دێڕەکـانی ڕووداوەکـاندا حەشـار دراون و... زمـانی جیـهانی پەنـهان(غیـــب)ە لـە جیـهانی بینراو(شهادة)دا و.. گەنجینەی گفتوگۆ ئەزەلی‌یە پاك و بێ‌گەرد و، ئاوڕدانەوە ئەبەدی‌یەکانی

خوای میهرەبانە کە لە جیهانی پەنهانی پشت پەردەی ئەم جیهانە بینراوەوە هاتووە و.. خۆر و بناغـە و نەخشـە و ئـەندازەی جیـهانی مەعنـەویی ئیسـلامە و.. نەخشـەیەکی خـاوێن و موقەددەسـی جیهانەکانی ئەودنیایە و.. تەفسیری ئاشکرا و بەڵگەی مەحکەم و تەرجومانی ڕووناکی زات و سیفات و کاروبار و ناوەکانی خواوەندە و.. پەروەردەکار(مُربّـــي)ی ئـەم جیـهانی مرۆڤایەتی‌یەیـە و.. بـە وێنـەی "ئـاو" و "ڕووناکی"ش وایـە بۆ مرۆڤایـەتیی مـەزن کـە ئیسـلامەتی‌یە و.. دانـایی ڕاستەقینەیە بـۆ ڕەگـەزی مـرۆڤ و.. ڕێ‌پیشـاندەری گـرۆی ئادەمیزادیشە بۆ لای ئـەو شتانەی کـە بەختـەوەری‌یان تێدایـە و.. هـەروەك بۆ مـرۆڤ کتێبی شـەریعەتە، کتێبـی دانستیشـە.. هـەروەك کتێبـی دوعـا و بەندایەتی‌یـە، کتێبـی فـەرمان و بانگەوازیشە.. هەروەك کتێبی زیکرە، کتێبی فیکریشە و.. تاقانە کتێبی موقەددەسی پیرۆزە کە هـەموو ئەو کتێبانـەی تێـدا جـەم بوویێـت کـە پێداویسـتی‌یە مەعنەوی‌یـەکانی مـرۆڤ دەهێننەدی. تەنانەت ئەم قورئانە بۆ مەشرەبی هەر یەکە لە ئەهلی مەشـرەبە جۆراوجۆرەکـان و ڕێبازی هەموو یەکێ لە خاوەن ڕێبازە جیاجیاکـانی: ئـەولیا و صیددیقـان و خواناسـان و زانـا لێکۆڵەرەکان، بۆ هەریەك لەمانە، نامەیەکی پیشان داوە کە شیاوی چێژ و ڕووناك کردنەوەی مەشرەبەکەی ئەو بێت و لەگەڵ ڕوونکردنەوە و ڕێڕەوی ئەو ڕێبازەدا بگونجێـت. کەواتـە ئـەم کتێبە ئاسمانی‌یە دەڵێی کتێبخانەیەکی موقەددەسی پڕ لە کتێبە!

***بەشی دووهەم و تەواوکەری پێناسەکە:***

لە وتەی دوازدەهەمدا ڕوون کراوەتەوە و چەسپێنراوە کە:

قورئانی پیرۆز: لە عەرشی هەرەمەزن و، لە (ناوی هەرە مەزن) و، لە پلەی هەرە گـەورەی هەموو یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورەوە نازڵ بووە. کەواتە قورئـانی پیرۆز بریتی‌یـە لە:

"گوفتاری خواوەند" بەو سیفەتەی کە "پەروەردگاری هەموو جیهانەکان"ە و.. "فەرمانی خوای گەورە" بەو سیفەتەی کە خوای گەورە "خوای هەموو بوونەوەران"ە و.. "فەرمایشتی ئەو" بەو سیفەتەی کە "بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانەکان"ە و.. "فەرموودەی پیرۆزی ئـەو" بـەو سیفەتەی کە پەروەردگاری ڕەهایە لە بوونەوەردا و.. "فەرمایشتی ئەزەلیی ئەو" کـە بـە نـاوی پادشـایەتی و دەسـتەڵاتداریی هەمەلایەنـە و مەزنـەوە فەرموویـەتی و.. "تۆمـاری ڕێزلێنـانی خـواوەندی میـهرەبان" کـە لـەو بەزەیی‌یـە فراوانـەوە هـەڵقوڵاوە کـە هەمـوو شـتێکی گـرتووەتەوە و.. "کۆمەڵە نامەیەکی پەروەردگاری‌یانە"ی ئەوتۆیە کە مەزنیی خوایـەتیی ئـەو ڕوون دەکەنەوە، چونکە لە سەرەتای هەندێ لـەم نامانـەدا چـەند هێمـا و پەرلـە(شــفرة)یـەك بەکارهێنراوە کە ئەمە دەگەیەنن و.. ئەو کتێبە پیرۆزەیە کە دانـایی لـێ دەبارێت و.. قورئـانی پیرۆز لە مەقامی دورەدەر بە ئیسمی ئەعزەمەوە نازڵ بووە و دەڕوانێتە هەموو ئەو شتانەی کە

عەرشی ئەعزەم دەورەی داون و، لەم نهێنییەوەیە کە قورئانی پیرۆز، بە هەمیشە و بەردەوامی، ناوێکی شایستە و شایانی خۆی لێ نراوە و پێی وتراوە: "کلام الله" واتە: فەرمایشتی خوای گەورە.

پلەی کتێب و صوحوفە پیرۆزەکانی پێغەمبەرانی تر - درووودیان لەسەر بێت - لە دوای پلەی قورئانی پیرۆزەوە دێت. بەڵام فەرمووودەکانی تری خواوەند - کە هەرگیز تەواو نابن - هەندێکیان گفتوگۆیە کە لە شێوەی ئیلهامدا و، لە ڕوویەکی تایبەتییەوە و بە ناونیشانێکی هەندەکی و درەوشانەوەیەکی تایبەتیی ناوێکی تایبەت و پەروەردگاری و دەستەڵاتێکی تایبەتی و بە میهرەبانییەکی تایبەت، ئاراستە کراوە. جا ئیلهامەکانی: مەلائیکەت و، مرۆڤ و، گیانلەبەران، بەپێی: "هەمەکێتی" و "تایبەت"بوونیان، گەلێ زۆر و جۆراوجۆرن.

***بەشی سێهەم:***

قورئانی پیرۆز: کتێبێکی ئاسمانییە و، بە کورتی و پوختی کتێبەکانی گشت ئەو پێغەمبەرانەی کە سەردەمەکانیان لە یەکتر جیاوازە و، پەیام و نامیلکەکانی هەموو ئەولیاکان کە مەشرەبیان جۆراوجۆرە و، ئاسەواری هەموو ئەصفیاکان کە ڕێبازەکانیان لە یەکتر جیایە، هەموو ئەمانەی بە پوختی لەخۆ گرتووە و.. هەر شەش لاکەی ڕووناك و درەخشانە و لە تاریکیی وەهم و چڵکی گومان خاوێنە، چونکە خاڵی پشت پێ بەستنی: "وەحی"ی ئاسمان و گوفتاری ئەزەلییە، بە دڵنیایی و.. مەبەست و ئامانجیشی: بەختەوەریی هەمیشەییە، وەك بە چاو دەبینرێت و.. ناوەرۆکیشی: ڕێنماییەکی پاك و بێ گەردە، کە ئەمەش بە بەداهەت دەزانرێت و.. لە لای سەرەوەشی، بە ئاشکرا: نوورەکانی ئیمانە و.. لای خوارەوەشی: بەڵگەیە، بە "علم اليقين" و.. لای ڕاستی: تەسلیم بوونی دڵ و هەناوە، وەك بە تاقیکردنەوە چەسپاوە و.. لای چەپیشی: ڕامکردن و مل پێ کەچ کردنی ژیرییە، بە "عين اليقين" و.. بەروبوومیشی: میهرەبانیی خواوەندی ڕەحمان و، خانەی بەهەشتە، بە "حق اليقين" و.. پلەوپایەشی: قبووڵ بوونیەتی لە لایەن مەلائیکەت و ئادەمیزاد و جیننییەوە، کە ئەمەش بە "حَدْس"ێکی ڕاست زانراوە و هەستی پێ کراوە.

* * *

هەموو یەکێك لەم سیفەتانەی کە لە هەر سێ بەشەکەی پێناسەی قورئانی پیرۆزدا باس کران، لە چەند جێگایەکی تردا بە چەشنێکی بێ گومان چەسپێنراوە، یان لەمەولا دەچەسپێنرێت. کەواتە ئەو دەعوایەمان ئیددیعایەکی بێ بەڵگە و بێ پشت و پەنا نییە، بەڵکو هەموو یەکێ لەو سیفەتانە بەڵگەی چەسپێنەر و بێ گومانی لەسەر هەیە.

# ڕۆشنایی یەکەم

## ئەم ڕۆشناییەیە سێ تیشکی لێ بووەتەوە

# تیشکی یەکەم

## ڕەوانبێژیی قورئان موعجیزەیە

ئەم ڕەوانبێژییە خاوەن ئیعجازەی قورئان لە: پاراوی و جوانی و پتەویی هۆنین و.. ناوازەیی و نامۆیی و باشیی شێوازەکان و.. تەواوی و بەرزی و خاوێنیی ڕوونکردنەوە و.. هێز و ڕاستیی واتاکان و.. زمانپاراوی و ڕەوانیی وشەکانیەوە، هەڵقوڵاوە.

وا هەزار و سێ سەد ساڵە قورئانی پیرۆز، بەم ڕەوانبێژییە دەراسایەی، تەحەددای زیرەکترین ڕەوانگۆ و کارامەترین وتارخوێن و مەزنترین زانای نەوەی ئادەمیزادی کردووە، کەچی تا ئێستا نەچوونەتە مەیدانی و نەیانتوانیوە لە ئاستیدا دەم بکەنەوە، هەرچەندەش قورئان بە توندوتیژی پەیتا پەیتا تەحەددای کردوون. بەڵکو تێکڕا بە زەلیلییەوە ملیان بۆ کەچ کرد و سەریان بۆ دانەواند، لە کاتێکدا کە ڕەوانگۆی وەهایان تێدایە سەری غرووری لە هەور دەخشێنێت!

وا بە دوو "شێوە" ئاماژە بۆ ڕووی ئیعجاز لە ڕەوانبێژیی قورئاندا دەکەین:

***شێوەی یەکەم:***

زۆربەی دانیشتووانی دوورگەی عەرەب نەخوێندەوار بوون، بۆیە ئەو شتانەی کە مایەی شانازییان بووە و، ڕووداوە مێژووییەکان و، پەند و دانایی و، ڕەوشتجوانیی خۆیان، لە شیعر و گوفتارە ڕەوانەکانیاندا دەپاراست کە دەماودەمیان پێ دەکرا، لە بریی نووسینەوەیان. ئەوەبوو گوفتاری پڕ واتا و دانایی لە زەینەکاندا جێی خۆیان دەگرت و لە پێشینانەوە بۆ ئەوانەی دوای خۆیان دەماودەم دەمایەوە. ئەم پێویستییە سروشتییەی ئەوان وای لێ کردبوون کە باشترین و بە برەوترین کاڵای بازاڕی ڕۆژگارەکەیان "ڕەوانبێژی" و "زمانپاراوی" بێت، بە ڕادەیەك کە ڕەوانگۆی هەر تیرە و هۆزێك بە ڕەمزێکی سەربەرزی و باڵەوانێکی شانازی پێوەکراوی هۆز دادەنرا.

بەڵێ، ئەو نەتەوەیەی کە دوای موسڵمانبوونیان، بە زیرەکی و وریایی خۆیان، جڵەوی سیاسەت و حوکمڕانیی جیهانیان گرتە دەست، لەناو گشت نەتەوەکانی جیهاندا لە چڵەپۆپەی بواری ڕەوانبێژیدا بوون و، ڕەوانبێژی لە لایان گەلێ برەوی پێ دەدرا و پێویستییەکی زۆریشیان پێی هەبوو، تەنانەت بە مایەی شانازیی خۆیانیان دەژمارد، بگرە

تەنها بە گوفتارێك كە لە زاری ڕەوانگۆیەكیانەوە دەربچوایە یان جەنگ لە نێـوان دوو تیرەدا هەڵدەگیرسا یان ئاشتی دەكەوتـە نێوانیانـەوە! تەنانـەت حـەوت پارچـە شیعری ڕەوانگۆترین شاعیرانی خۆیان بە ئاوی زێڕ نووسیبووەوە و، بە دیە اری كەعبـەدا هەڵیانواسیبوو، كە پێیـ دەوت: "المعلقات السبعة" و ڕەمزی شانازییان بوو.

ئا لـەم كاتەدا قورئانی پیرۆز نازڵ بوو كە "ڕەوانبێژی" گەیشتبووە چڵەپۆپەی بایەخ و بـرەو پێدان. بە وێنەی موعجیزەی حەزرەتی مووسـا و عیسـا – درووودیـان لەسـەر بێـت – كە بـە شـێوە و جۆری شتانی بایەخ پێدراوی زەمانی خۆیان بوون، كە بریتی بوون لـە "سیحر" بـە زەمانی حەزرەتی مووسادا و "پزیشكی"ش لە زەمانی حەزرەتی عیسادا!

بەڵێ، قورئان ئا لـەم كاتەدا هاتەخوار و، بە ڕەوانبێژییەكەی خۆی تەحەددای بۆ سەرجەم ڕەوانگۆیانی سەردەمەكەی خـۆی و گشـت سـەردەمەكانی دواتریـش ڕاگـەیاند و، داوای لـە ڕەوانگۆ عەرەبەكان كرد كە بەرەنگاری ببنەوە و لاسـایی بكەنـەوە و بێنـە مـەیدانی و شتێكی هاووێنەی قورئان بهێنن با وەك بچووكترین سوورەتیشی وابیت! ئەوەبوو لە پێشدا بـەم ئایەتـە تەحەددای كردن: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنا على عَبْدِنا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ﴾(البقرة:٢٣) پاشان ئەم تەحەددییەی لەسەر توند كردن و فەرمووی: ﴿فَإِن لَمْ تَفْعَلُواْ وَلَنْ تَفْعَلُوا فَـــاتَّقُوا النَّارَ﴾(البقرة:٢٤) واتـە: بـەرەو دۆزەخ – كـە خراپـترین ئەنجامـە – دەدرێنەبـەر. ئـەم شـێوازەش غروور و كەش و فشی ئەوانی دەشكاند و گاڵتـەی بـە بیر و ژیریـی ئـەوان دەكـرد و حوكمـی ئیعدامی هەر لـە دنیادا – چ جای قیامەت – بۆ دەردەكردن. واتە: یان دەبێ شتێك بڵێن وەكو قورئـان وابیت، یـان مـادەم سـوورن لـەسـەر كوفـر و باوەڕنـەهێنان ئـەوا گیـان و سـامانتان لـە مەترسیدایە!

جا ئـەگـەر بەرەنگاربوونـەوەی قورئانیـان بـە هێنـانی چـەند دێڕێكـی وەك ئـەو لـە توانـادا بوایە و، ئەو ڕێگایەیان بە ئاسانی بۆ بگیرایەتەبەر و بیانتوانیایە بەمە دەعـوا و تەحەددییەكـەی قوز[illegible]كەنەوە، ئایـا ڕێگـای جـەنگ و كاولكارییـان هـەڵدەبژارد كـە وەك ئاشكرایە مەترسییەكانی ئەم ڕێیە گەلێ زیاترە و ئەرك و گیروگرفتەكانیشی یەكجار زۆرن؟

بەڵێ، ئایا دەگونجێ ئـەو مرۆڤـە زیرەكانـەی كـە – لـە دواییدا – بـە سیاسـەت و زیرەكیـی خۆیان هەموو جیهانیان بەڕێوەبرد، ئاسانترین و بێوەیترین ڕێ پشت گوێ بخەن و ئـەو ڕێگـا هەڵەت و سەختە هەڵبژێرن كە گیان و سامانیان لەناو دەبات؟

خۆ ئەگـەر ڕەوانگۆكانیـان بیانتوانیایـە بـە چـەند پیتێـك بـەرەنگاری قورئـان ببنـەوە، ئـەوا قورئـان وازی لـە دەعواكـەی خـۆی دەهێنـا و، ئـەوانیش لـە كاولكـاریی مـاددی و مەعنـەوی ڕزگاریان دەبوو، كەچی ڕێگای ترسناك و دوور و درێژی جـەنگیان هـەڵبژارد. بـەو واتایـەی

کە بەرەنگاربوونەوەی قورئان بە پیت و گوفتار و دارشتنی هاوویّنەی ئەو، کاریّکی مەحاڵەو لە توانای کەسیاندا نی‌یە. بۆیە لە ناچاری‌دا دەستیان دایە شمشێر و ڕێی جەنگیان گرتەبەر!

پاشان دوو هاندەری یەکجار بەهێز هەن بۆ بەرەنگاری کردنی قورئان و هێنانی گوفتاری وەك ئەو، کە بریتین لە:

یەکەم: سووربوونی دوژمنانی لەسەر بەرەنگاربوونەوەی.

دووهەم: حەزی دۆستان و شوێنکەوتووانی بۆ چاولێکەری و لاسایی کردنەوەی.

ئەوەتا لە ژێر تین و تەوژمی ئەم دوو ئارەزووە توندەی هەردوو لادا ملیۆنەها کتێبی عەرەبی دانراون، بێ ئەوەی هیچ کام لەو کتێبانە بە هیچ جۆرێك لە قورئان بچێت! چونکە هەر کەسێك ئەو کتێبانە دەبینێت - چ زانا بێت و چ نەزان - ناچارە کە بڵێت: قورئان لە هیچ کامی ئەم کتێبانە ناچێت و هیچ کامیشیان هەرگیز بەرەنگاریی قورئانی پێ ناکرێت. جا یان ئەوەیە ڕەوانبێژیی قورئان لە هی هەموویان نزمترە، کە ئەمەش بە یەکدەنگیی دۆست و دوژمنانی مەحاڵ و بەتاڵە، یان قورئان لە سەرووی هەموویانەوەیە و پلەی لەوان بەرز و بڵندترە.

**ئەگەر دەڵێیت:**

چۆن دەزانین تا ئێستا هیچ کەسێك بەرەنگاریی قورئانی پێ نەکراوە؟ ئایا تا ئێستا کەس پشتی بە خۆی و توانا و بەهرەکانی نەبەستووە تاکو بڕواتە گۆڕەپانی تەحەددیی قورئانەوە: ئایا هاوکاری و پشتگیری‌یان بۆ یەکتری هیچ سوودێکی لەم بوارەدا پێ نەگەیاندوون؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

ئەگەر بەرەنگاری کردنی قورئان لە تواناندا بوایە ئەوا بێ هیچ گومانێك هەوڵیان بۆ دەدا و سستی‌یان تێدا نەدەکرد، چونکە کێشەی شەرەف و عیززەت و لەناوچوونی گیان و سامانی پێوە بەسترابوو. خۆ ئەگەر لە ڕاستی‌دا ئەم بەرەنگاری‌یە ڕووی بدایە ئەوا کەسانێکی زۆر پشتیان دەگرت و دەیاندایە پاڵی، چونکە کەسانی سەرسەخت و نەیارانی حەق لە هەموو کاتێکدا بە زۆری هەن. ئنجا گەر کەسێك ببوایە پشتی ئەم بەرەنگاری‌یەی بگرتایە ئەوا پێی دەناسرا و ناوبانگی پێ دەردەکرد. ئەوەبوو لە ڕوودانی مشت و مڕێکی بچووکدا دەچوون شیعریان دەهۆنی‌یەوە و بە مایەی شانازی و ئازایەتی‌یان لە قەڵەم دەدا، ئەی ئەگەر ململانێ‌یەکی سەرسووڕهێنی ئاوا ڕووی بدایە چۆن دەشاررایەوە و بە پەنهانی لە مێژوودا دەمایەوە؟ خۆ ئەوان ناشیرینترین تانە و تەشەریان بەرامبەر بە ئیسلام بڵاوکردەوە، کەچی لە بواری بەرەنگاربوونەوەی قورئاندا هیچ شتێك لە مێژوودا باس نەکراوە، جگە لە چەند وشەیەکی دەمهەڵبەستی "موسەیلەمەی درۆزن" کە بۆ ئەم مەبەستە هەڵی بەستبوون.

ئەم موسەیلەمەیەش هەرچەندە خاوەنی ڕەوانبێژی‌یەکی گاڵتە پێنەکراو بووە، کەچی کاتێ ڕەوانبێژی‌یەکەی بەراورد کراوە لەگەڵ ڕەوانبێژیی ئەو قورئانەدا کە لە سەرووی

هەموو جوانی‌یه‌كەوەیه‌، بە ورپنه‌ له‌ قه‌ڵه‌م دراوه‌ و له‌سه‌ر لاپه‌ڕه‌كانی مێژوودا بەو ناوه‌ تۆمار كراوه‌!

بەم جۆره‌، ئیعجاز له‌ ڕه‌وانبێژیی قورئاندا یه‌قینێكه‌ وەك دڵنیابوون وایه‌ له‌وه‌ی كه‌ دوو كه‌ڕه‌ت دوو ده‌كاته‌ چوار. هەر بۆیه‌ ده‌بێ ئەو ئیعجازه‌ وابێت.

***شێوه‌ی دووهه‌م:***

وا به‌ پێنج خاڵ "**حیكمه‌تی ئیعجاز له‌ ڕه‌وانبێژیی قورئاندا**" ڕوون ده‌كه‌ینه‌وه‌.

● **خاڵی یه‌كه‌م:**

**پاراوی‌یه‌كی ده‌راسا له‌ "هۆنین"ی قورئاندا هه‌یه‌.**

كتێبی "إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز" هه‌ر له‌ سه‌ره‌تاوه‌ تا كۆتایی، ئه‌م پاراوی و مه‌حكه‌می‌یه‌ی هۆنینی قورئانی ڕوون كردووه‌ته‌وه‌. چونكه‌ هه‌روه‌ك میله‌كانی چركه‌ و خوله‌ك و كاتژمێری سه‌عات هه‌ریه‌كه‌یان ڕێسای ئه‌وی تر ته‌واو ده‌كات، هۆنینی شێوه‌ و ڕوخساری هه‌موو یه‌كێ له‌: ڕسته‌كانی قورئان و، ڕێسای نێوان وشه‌كانی و، ڕێكیی موناسه‌به‌تی ڕسته‌كانی له‌ ئاستی یه‌كتری‌دا، به‌ هه‌مان جۆره‌. هه‌موو ئه‌مانه‌ش له‌و ته‌فسیره‌ ناوبراوه‌دا به‌ ته‌واوی ڕوون كراونه‌ته‌وه‌. هه‌ر كه‌س ده‌یه‌وێت با سه‌ری لێ بدات و بیخوێنێته‌وه‌، تاكو بتوانێت ئه‌م پاراوی‌یه‌ ده‌راسایه‌ی هۆنینی ڕسته‌ و وشه‌كانی قورئان له‌ جوانترین شێوه‌ی‌دا ببینێت. به‌ڵام لێره‌دا ته‌نها دوو نموونه‌ بۆ هۆنینی وشه‌ ده‌ست له‌ملانه‌كانی ڕسته‌كانی قورئان، ده‌هێنینه‌وه‌. (كه‌ ده‌ری ده‌خه‌ن: جگه‌ له‌و وشانه‌ هیچ وشه‌یه‌كی تر ئاوا به‌ ڕێكی و وردی و ته‌واوی جێگه‌یان ناگرێته‌وه‌).

○ نموونه‌ی یه‌كه‌م:

﴿وَلَئِنْ مَسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِنْ عَذَابِ رَبِّكَ﴾ (الأنبياء:٤٦).

ئه‌م ڕسته‌یه‌ بۆ ده‌رخستنی سام و گه‌وره‌یی سزای دۆزه‌خ هێنراوه‌، به‌ڵام به‌ ده‌رخستنی كاریگه‌ریی یه‌كجار سه‌ختی كه‌مترینی ئه‌و سزایه‌! (تاكو ده‌ری بخات كه‌ ئه‌گه‌ر كه‌مترینی ئه‌و سزایه‌ هێنده‌ سه‌خت بێت، ده‌بێ زۆره‌كه‌ی چۆن بێت)؟! له‌به‌ر ئه‌وه‌، هه‌موو یه‌كێ له‌ سیما و ڕوخساره‌ پێكهێنه‌ره‌كانی ئه‌م ڕسته‌یه‌ی كه‌ بۆ "ته‌قلیل"(كه‌م پیشاندان) هێنراوه‌، بۆ ئه‌م ته‌قلیله‌ ده‌ڕوانێت و به‌هێزی ده‌كات، تاكو سام و گه‌وره‌یی ئه‌و سزایه‌ ده‌ربخات.

ئه‌وه‌تا وشه‌ی ﴿لَئِنْ﴾ بۆ گومان دروستكردنه‌! خۆ گومانیش "كه‌می"ی ئه‌و شته‌ به‌ گوێی مرۆڤدا ده‌دات.

وشه‌ی ﴿مَسَّ﴾ كه‌ به‌ركه‌وتنێكی كه‌مه‌، ئه‌ویش "كه‌می" ده‌گه‌یه‌نێت.

ئنجا مادده‌ی وشه‌ی ﴿نَفْحَةٌ﴾ بۆن و به‌رامه‌یه‌كی كه‌م ده‌گه‌یه‌نێت، كه‌ ئه‌ویش به‌ هه‌مان جۆر واتای "كه‌می" به‌ ده‌سته‌وه‌ ده‌دات. هه‌روه‌ك صیغه‌ و وه‌زنی وشه‌كه‌ش، كه‌ مه‌صده‌ری

"المرّة"یە، بۆ یەك دانەی بچووك بەكار دێت، بەپێی "عیلمی صەرف". كە ئەمەش، بە هەمان جۆر، "كەمی" دەگەیەنێت.

تەنوینی تەنكیریش لە وشەی ﴿نَفْحَةٌ﴾دا بۆ مەبەستی "كەمی"ی نەفحەكەیە. بەو واتایەی كە شتێكی هێندە بچووك وەختە هەر هەستی پێ نەكرێت، بۆیە ناناسرێت و بە "نەكیرە" ناوی دەبرێت!

وشەی ﴿مِنْ﴾یش بۆ "تَبعیض"ە. واتە بەشێكی كەم، كە ئەمەش بە هەمان جۆر "كەمی" دەگەیەنێت.

وشەی ﴿عَذاب﴾یش كە لە چاو "نكال" و "عقـــــاب"دا جۆرێكی سووكەڵە و تەنكی سزایە، ئاماژە بۆ ئەو "كەمی"یە دەكات.

بەكارهێنانی وشەی ﴿ربِّكَ﴾یش لە بریی: "القـــهّار، الجبّـــار، المنتقـــم" بە هەمان جۆر "كەمی"ی ئەو سزایە دەگەیەنێت، چونكە واتای سۆز و میهرەبانی بە گوێی هەستی مرۆڤدا دەدات!

بەم جۆرە، ئەم ڕستەیە ئەوە دەگەیەنێت كە:

ئەگەر لەگەڵ ئەم هەموو "كەمی"یەدا سزاكە تا ئەم ڕادەیە سەخت و كاریگەر و توند و تیژ بێت، دەبێ سام و مەترسیی عیقاب و تۆڵەی خوا چەندە گەورە بێت؟!

سەرنج لەم "ڕستە"یە بدە با بە چاوی خۆت ببینیت كە چۆن: وشە و سیما و ڕوخسارە پێكهێنەرەكانی، هاوكاریی یەكتر دەكەن و بەدەم خواستی یەكەوە دەڕۆن و، هەریەكەیان لە لایەنی خۆیەوە یارمەتیی هاتنەدیی مەبەستەكە دەدات.

ئەم نموونەیەی كە هێنامانەوە، "وشە" و "ئامانج"یشی ڕەچاو كردووە.

❍ نموونەی دووهەم:

﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ (البقرة:٣).

ڕوخسارە پێكهێنەرەكانی ئەم ڕستەیە، ئاماژە بۆ پێنج مەرجی قبووڵبوونی "صەدەقە" دەكات:

مەرجی یەكەم: ئەوەیە كە لە (مِن)ی (تبعیضیـــة)ی وشەی ﴿مِمَّـــا﴾ وەردەگیرێت. واتە خێرەومەند هەرچییەكی هەیە نەیبەخشێت، تاكو خۆیشی موحتاجی وەرگرتنی صەدەقە نەبێت!

مەرجی دووهەم: ئەوەیە كە لە وشـــەی ﴿رَزَقْنَاهُمْ﴾ وەردەگیرێت. واتە لە "ئەحـمەد"ی وەرنەگرێت و بیدات بە "مەحموود"! بەڵكو دەبێ لە ماڵ و سامانی خۆی بێت. بەو واتایەی كە: لەو ماڵ و سامانە ببەخشن كە ڕۆزیی خۆتانە.

مەرجی سێهەم: ئەوەیە كە لە ڕاناوی "نا"ی وشەی ﴿رَزَقْنَـــا﴾ وەردەگیرێت. واتە: بەخشەرەكە منەت نەكات و ئەو ماڵەی كە دەیبەخشێت بە لایەوە زۆر نەبێت. بەو واتایەی

صه‌ده‌قه‌كانتان منه‌تی تێدا نی‌یه‌، چونكه‌ من ڕۆزیتان ده‌ده‌م و له‌ ماڵ و سامانی من به‌ به‌نده‌كانم ده‌به‌خشن.

مه‌رجی چوارهم: ئه‌وه‌یه‌ كه‌ له‌ وشه‌ی ﴿يُنْفِقُــونَ﴾ وه‌رده‌گیرێت. واته‌: به‌و كه‌سه‌ی ببه‌خشێت كه‌ له‌ پێویستی و نه‌فه‌قه‌ی ناچاره‌كیی خۆی‌دا خه‌رجی بكات. ده‌نا ئه‌و صه‌ده‌قه‌یه‌ قبووڵ نابێت گه‌ر بدرێت به‌ كه‌سێك له‌ هه‌رزه‌یی‌دا خه‌رجی بكات.

مه‌رجی پێنجه‌م: ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئه‌ویش له‌ وشه‌ی ﴿رَزَقْنَــاهُم﴾ وه‌رده‌گیرێت. واته‌ ده‌بێ خێر كردن به‌ ناوی خواوه‌ بێت. به‌و واتایه‌ی كه‌: ئه‌و سه‌روه‌ت و سامانه‌ی له‌ لاتانه‌ هی منه‌. كه‌واته‌ ده‌بێ به‌ ناوی منه‌وه‌ لێی ببه‌خشن..

سه‌ره‌ڕای ئه‌م هه‌موو مه‌رجانه‌ش، ئایه‌ته‌كه‌ "ته‌عمیم"ی تێدایه‌ بۆ هه‌موو خێر و چاكه‌ و صه‌ده‌قه‌یه‌ك. چونكه‌ هه‌روه‌ك صــه‌ده‌قه‌ و خێر به‌ ماڵ و ســامان ده‌كرێت، به‌: زانست و گـوفتار و كردار و ئامۆژگاریش ده‌كرێت. هه‌موو ئه‌م به‌شانه‌ش وشه‌ی: "ما"ی ﴿مِمَّــا﴾ به‌و عوموومییه‌ته‌ی كه‌ تیایدایه‌، ئاماژه‌ی بۆ ده‌كات، به‌ تایبه‌تی له‌م ڕسته‌یه‌دا. چونكه‌ "ما" لێره‌دا به‌ شێوازی "موتڵه‌ق" هاتووه‌ كه‌ عوموومی و گشتی‌بوون ده‌گه‌یه‌نێت.

بەم جۆره‌، ئه‌م ڕسته‌ كورت و پوخته‌ی كه‌ له‌ صه‌ده‌قه‌ ده‌دوێت، پێنج مه‌رجی صه‌ده‌قه‌ و خێر به‌ "ژیری"ی مرۆڤ ده‌به‌خشێت و، مه‌یدانه‌ فراوانه‌كه‌ی بۆ ده‌رده‌خات و، شێوه‌ی به‌خشینیشی فێر ده‌كات.

سیما و ڕوخساره‌ پێكهێنه‌ره‌كانی ڕسته‌كانی قورئانی پیرۆز، گه‌لێ ڕێسای هۆنینی وه‌ك ئه‌مه‌یان تێدایه‌. هه‌روه‌ك هۆنینی وشه‌كانیشی له‌ به‌رامبه‌ر یه‌كتره‌وه‌ بوارێكی فراوانی وه‌ك ئه‌مه‌یان هه‌یه‌ و، سه‌رجه‌م گوفتار و ڕسته‌كانیشی دارای بازنه‌ی هۆنینی وه‌ك ئه‌مانه‌ن.

○ بۆ نموونه‌:

﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ ۞ اللهُ الصَّمَدُ ۞ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يولَدْ ۞ وَلَمْ يَكُن لَهُ كُفواً أَحَدٌ﴾.

ئه‌م ئایه‌ته‌ مه‌زنانه‌ شه‌ش ڕسته‌یان تێدایه‌: سیانی موسبه‌ت و سیانی مه‌نفی، كه‌ شه‌ش پله‌ی "ته‌وحید" ده‌چه‌سپێنن و به‌رپه‌رچی شه‌ش جۆری "شیرك"یش ده‌ده‌نه‌وه‌. جا هه‌موو یه‌كێك له‌م ڕستانه‌، له‌ لایه‌كه‌وه‌ "به‌ڵگه‌"یه‌ بۆ ڕسته‌كه‌ی تر و له‌ لایه‌كی تریشه‌وه‌ ده‌بێت به‌ "ئه‌نجام"ی ئه‌و. چونكه‌ یه‌ك به‌ یه‌كی ئه‌و ڕستانه‌ دوو واتایان تێدایه‌، ڕسته‌كه‌ به‌پێی یه‌كێكیان ئه‌نجامه‌ و به‌پێی ئه‌وی تریشیان به‌ڵگه‌یه‌..

واته‌ سووره‌تی "ئیخلاص" سی دانه‌ سووره‌تی ڕێكوپێكی "ئیخلاص"ی تێدایه‌ كه‌ له‌ چه‌ندین به‌ڵگه‌ی یه‌كتر چه‌سپێن پێكهاتوون! ئه‌ویش به‌م جۆره‌ی خواره‌وه‌:

قُلْ هُوَ اللهُ: لأنه أحد، لأنه صمد، لأنه لم يلد، لأنه لم يولد، لأنّه لم يكن له كفواً أحد.

هه‌روه‌ها: وَلَمْ يَكُن لَهُ كُفواً أَحَدٌ: لأنّه لم يولد، لأنه لم يلد، لأنه أحد، لأنه هو الله.

هەروەها: هُوَ اللّٰه: فهو أحد، فهو صمد، فإذاً لم يلد، فإذاً لم يولد، فإذاً لم يكن له كفواً أحد.

ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە بۆ خۆت برۆ و قیاس بکە!

○ نموونەیەکی تر:

﴿الم ۞ ذٰلِكَ الْكِتابُ لا رَيْبَ فيه هُدَىً لِلْمُتَّقين﴾ (البقرة:١-٢).

هەموو یەکێکی ئەم چوار ڕستەیە دوو واتای تێدایـە، چونکـە ڕستەکە بەپێی یـەکێك لـەو دوو واتایە "بەڵگە"یە بۆ ڕستەکانی تر و، بەپێی واتاکەی تریشی "ئەنجام"ی ئـەو ڕستانەیە. جا بەم پێیە و بە شازدە هێڵی موناسەبە و پەیوەندی، نەخش و نیگارێکی هۆنینی ئیعجاز دروست دەبێـت. ئەمـەش کتێبی "إشـارات الإعجاز" ڕوونـی کردووەتـەوە، بە ڕادەیـەك کـە دەڵێیـت هەموو یەکێکی زۆربەی ئایەتەکانی قورئان چاوێکی تێدایە و دەڕوانێتە زۆربەی ئایەتـەکان و، ڕوویەکیشی هەیە پێی دەڕوانێتە ئەوان و، چەندین هێڵی مەعنەوی و موناسـەبەو پـەیوەندی‌یان لـە نێوانـدا دەنووسـێت و، بـەم کارەشـی نیگـارێکی "ئیعجـاز" دەکێشـێت. وەك لـە وتـەی سیازدەهەمدا باس کراوە. باشترین شایەت لەسەر ئەمە "إشـارات الإعجـاز"ە چونکـە هـەر لـە سەرەتاوە تا کۆتایی، ئەم "پاراویی هۆنین"ەی قورئان ڕوون دەکاتەوە.

● **خاڵی دووەم:**

**ڕەوانبێژیی دەراسا لـە "واتاکانی" قورئاندا.**

ئەگەر حەز دەکەیت تامی ڕەوانبێژیی واتای ئەم ئایەتە پیرۆزە بچێژیت:

﴿سَبَّحَ للّٰهِ مَا في السَّمواتِ والأَرْضِ وَهُوَ العَزِيْزُ الحَكِيمُ﴾ (الحديد:١)..

ئەوا سەیری ئەم نموونەیە بکە کە لە وتەی سیازدەهەمدا ڕوون کراوەتەوە:

خۆت وا دابنێ کە لـە پێش هـاتنی نـووری قورئـان و لـە سـەردەمی جاهیلییـەت و بیابـانی ژیـانی دەشتەکی و نـەزانی‌دا دەژییـت. دەبینیـت لـەو کاتـەدا کـە هـەموو شـتێك بـە پـەردەی بێئاگـایی و، تـاریکیی نـەزانی و، بـەرگی سروشـت و، بیری وشـك داپۆشـراوە.. یەکسـەر زایەڵەی دەنگی ئایەتی: ﴿سَبَّحَ للّٰهِ ما في السَّمواتِ والأَرضِ﴾ یان ﴿تُسَـبِّحُ لَـهُ السَّـمواتُ والأَرضُ وَمَنْ فيهِنَّ﴾ (الإسـراء:٤٤) دەبیستیت و، دەبینیـت کـە ئـەو بوونـەوەرە بێ هەسـت و مردووانە، لە زەینی گوێبیستاندا دەبووژێنەوە و بە زایەڵەی دەنگی ﴿سَـبَّحَ﴾ و ﴿تُسـبِّحُ﴾ ژیانیان بە بـەردا دەچێـت و بۆ تەسبیح و یـادی خـواوەنـد ڕادەپـەڕن و لـێ دەبڕێـن. هـەروەها ڕووی تـاریکی ئاسمـانیش کـە چـەند ئەسـتێرەیەکی بێ گیـانی تێـدا بڵێسـە دەدات و، ڕووی زەویش کە چەند بوونەوەرێکی زەبوون و دەستەوسـانی لەسـەر دەژین، بـە زایەڵـە و نـووری: ﴿تُسبِّحُ﴾ لە بەرچاوی گوێبیستاندا دەگۆڕێـت بـە "دەم و زمـان"ێکـی دەمپـاراو بـە زیکـر و تەسـبیحی خـواوەنـد و، هـەموو ئەسـتێرەیەکیش تیشـکی نـووری حەقیقـەت دەپرژێنێـت و حیکمـەتێکی لەوپـەڕی دانـایی‌دا پـەخش دەکاتـەوە. ڕووی زەویـش، بـەو ڕوونـاکی و زایەڵـە

ئاسمانی‌یه‌ی قورئان، له‌به‌ر چاودا ده‌بێت به‌ "سه‌ر"ێكی مه‌زن بۆ جه‌سته‌یه‌ك كه‌ ده‌ریا و وشكایی له‌و سه‌ره‌دا دوو زمانی ده‌مپاراون به‌ زیكر و ته‌سبیح و ته‌قدیس و، سه‌رجه‌م رووه‌ك و گیانله‌به‌رانیش به‌ وێنه‌ی چه‌ند "وشه‌"یه‌كی زیكر و ته‌سبیح له‌ به‌رچاودا ده‌نوێنن، ده‌ڵێیت سه‌رتاسه‌ری زه‌وی گیانی به‌به‌ردا كراوه‌ و زینده‌وه‌رێكی خاوه‌ن ژیانه‌!

○ نموونه‌یه‌كی تر:

سه‌یری ئه‌م نموونه‌یه‌ بكه‌ كه‌ له‌ وته‌ی پازده‌هه‌مدا چه‌سپێنراوه‌:

**﴿يا مَعْشَرَ الجِنِّ والإِنْسِ إنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَنْفُذُوا مِنْ أَقْطارِ السَّموات والأَرضِ فَانْفُذُوا لا تَنْفُذُونَ إلاّ بِسُلْطان ❁ فَبِأيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبان ❁ يُرْسَلُ عَلَيْكُما شُواظٌ مِنْ نارٍ وَنُحاسٌ فَلا تَنْتَصِران ❁ فَبِأيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبان﴾** (الرحمن:٣٣-٣٦).

**﴿وَلَقَدْ زَيَّنّا السَّماءَ الدُّنيا بِمَصابيحَ وَجَعَلْناها رُجُوماً للشَّياطِينِ﴾** (الملك:٥).

گوێ له‌م ئایه‌تانه‌ رابگره‌ و بیریان لێ بكه‌ره‌وه‌ و بزانه‌ چی ده‌ڵێن؟

ئه‌وه‌تا ده‌ڵێن:

(ئه‌ی گرۆی جینیی و ئاده‌میزاد!

ئه‌ی له‌خۆبایی و هه‌ڵگه‌راوه‌كان!

ئه‌ی ئه‌وانه‌ی له‌ناو قوڕی كۆڵه‌واری و لاوازی‌دا چه‌قیون!

ئه‌ی سه‌رسه‌ختانی لاسار كه‌ له‌ناو هه‌ژاری و لاوازی‌دا ده‌تلێنه‌وه‌!

ئه‌گه‌ر گوێڕایه‌ڵی فه‌رمانه‌كانم نابن، ئه‌وا – گه‌ر له‌ تواناتاندایه‌ – له‌ سنووری موڵك و ده‌سته‌ڵاتی من ده‌ربچن! خۆ كه‌ ناشتوانن ئه‌و سنووره‌ بشكێنن و لێی ده‌ربچن، ئه‌دی چۆن پڕكێشی ده‌كه‌ن فه‌رمانی پادشایه‌كی هێنده‌ مه‌زن پشت گوێ ده‌خه‌ن كه‌ ئه‌ستێره‌ و مانگ و خۆره‌كانی له‌ده‌ستدایه‌ و، هه‌موو ئه‌وانه‌ – به‌ وێنه‌ی سه‌ربازی ئاماده‌ و ملكه‌چ – گوێڕایه‌ڵی فه‌رمانی ئه‌و ده‌بن؟ ئێوه‌ به‌م سنوورشكاندن و یاخی‌بوونه‌تان سنگ له‌ فه‌رمانڕه‌وایه‌كی ئه‌وه‌نده‌ گه‌وره‌ ده‌رده‌په‌ڕێنن كه‌ خاوه‌نی چه‌نده‌ها سه‌ربازی گوێڕایه‌ڵی سامداری وه‌هایه‌ كه‌ ده‌توانن چه‌ندین بۆمبی گه‌وره‌ گه‌وره‌ی به‌ ئه‌ندازه‌ی چیاكان بگرنه‌ شه‌یتانه‌كانیشتان، گه‌ر بتوانن خۆیانی له‌ به‌رده‌مدا رابگرن!

هه‌روه‌ها ئێوه‌ به‌م كافری و ناشوكری‌یه‌تان، له‌ ولاتی خاوه‌ن موڵكێكی هێنده‌ مه‌زن و شكۆداردا هه‌ڵده‌گه‌ڕێنه‌وه‌ كه‌ چه‌ندان سه‌ربازی گه‌وره‌ گه‌وره‌ی وای هه‌یه‌ ده‌توانن به‌ چه‌ندین بۆمبای گڕگرتوو و پارچه‌ ئاگر و پزیسكی به‌ قه‌ده‌ر زه‌وی و چیاكان بۆمبارانی دوژمنه‌ كافره‌كان بكه‌ن، با هه‌ریه‌كه‌ له‌و دوژمنانه‌ش به‌ ئه‌ندازه‌ی زه‌وی و چیا سه‌خته‌كان گه‌وره‌ و زه‌به‌لاح بن و، ده‌توانن له‌م ڕێیه‌وه‌ له‌ت و په‌ت و په‌رته‌وازه‌یان بكه‌ن، چ جای به‌دیهاتووانێكی لاوازی وه‌ك ئێوه‌؟

هەروەها ئێوە سەرپێچی لە یاسایەکی جێبەجێ کراوی ئەوتۆ دەکەن کە کەسانێك پەیوەستی بوون دەتوانن - بە ئیزن و فەرمانی خوای گەورە - بۆمب و ڕاجیمەی بە ئەندازەی ئەستێرەکانتان تێ بگرن).

لە بەر تیشکی ڕووناکیی ئەم نموونەیەدا: بەهێزیی واتا و، ڕەسەنیی ڕەوانبێژی و، بەرزیی سوودگەیاندنەکانی تر، لێك بدەرەوە.

● **خاڵی سێهەم:**

**ناوازەیی دەراسای "شێوازی" قورئان.**

بەڵێ، شێوازەکانی قورئانی پیرۆز هەروەك سەرسووڕهێن و قەناعەت بەخشن، نامۆ و ناوازەشن! قورئانی پیرۆز هەرگیز لاسایی کەسی نەکردووەتەوە و هیچ کەسیش ناتوانێت لاسایی بکاتەوە. ئەوەتا هەر لە سەرەتای نازڵ بوونیەوە و تا ئێستاش، وەکو یەکەم جاری، پارێزگاریی پاراویی شێواز و لاوی و ناوازەیی خۆی کردووە!

○ بۆ نموونە:

پیتە پچڕپچڕەکانی چەشنی: "الم. الر. طه. يس. حمعسق" وەکو چەند پەرلە(شفرة)یەك وان کە لە سەرەتای چەند سوورەتێکدا دانراون. لە "إشارات الإعجاز"دا شەش بریسکانەوەی ئیعجازمان لە بارەیانەوە نووسیوە، وا لێرەدا هەندێکیان لێ باس دەکەین:

ئەو پیتە ناوبراوانەی سەرەتای سوورەتەکان، "نیوە"ی هەموو "جووت"ێکی سیفەت و سروشتی پیتە هیجائی یەکانیان بەکار هێناوە، لەو پیتانەی کە پێیان دەوترێت: "المهموسة، المجهورة، الشديدة، الرخوة"[1] و بەشە زۆرەکانی تری سیفەت و سروشتی پیتەکان.. سەبارەت بە "تاك"ەکانیش - کە ناکرێن بە دوو بەشی وەك یەکەوە - ئەوا لەو بەشەیان کە لەسەر زمان قورسن وەکو پیتەکانی "قلقلة" نیوە کەمەکەیان و، لەوانەشیان کە لەسەر زمان سووکن وەکو "ذلاقة" نیوە زۆرەکەیانی بەکار هێناوە!

ڕێبازی قورئان لە هەڵبژاردنی نیوەی ئەو جۆرە پیتانە و.. گرتنەبەری ئەم ڕێگا پەنهانەی کە ژیری ناتوانێت لە نێوان ئەم ڕێ تێهەڵکێشانەی کە خۆیان لە دووسەد گریمان دەدەن،

---

(١) فذكر من (المهموسة) وهي ما يضعف الاعتماد على مخرجه، ويجمعها (ستشحثك خصفه) نصفها وهي الحاء والهاء والصاد والسين والكاف. ومن البواقي (المجهورة) نصفها يجمعه (لن يقطع أمر) ومن (الشديدة) الثمانية المجموعة في (اجدت طبقك) اربعة يجمعها (أقطك). ومن البواقي (الرخوة) عشرة يجمعها (حمس على نصره) ومن المطبقة التي هي الصاد والضاد والطاء والظاء نصفها. ومن البواقي (المنفتحة) نصفها. ومن (القلقلة) وهي حروف تضطرب عند خروجها ويجمعها (قد طبج) نصفها الاقل لقلتها. ومن (الليتين) الياء لأنها أقل ثقلاً، ومن (المستعلية) وهي التي يتصعد الصوت بها في الحنك الاعلى وهي سبعة: القاف والصاد والطاء والخاء والغين والضاد والظاء نصفها الاقل، ومن البواقي (المنخفضة) نصفها... (وەرگێر لە "تفسير البيضاوي"یەوە هێناویەتی ج١/ص٦٠).

پەیی پێ ببات و.. پاشان هێنانی ئەو گوفتارە لە ناوەندی ئەو مەیدانـە فراوانـەی کـە جێـی لـێ ئاڵۆزبوونە.. هەرگیز بە "ڕێکەوت" ڕوو نادات و لە توانای مرۆڤدا نییە!

جـا ئـەم پیتـە پچڕپچڕانـەی کـە لـە سـەرەتای سـوورەتەکاندان و چـەند پەرلـە(شـــفرة) و ڕەمزێکـی خوایـین، پێـنج شـەش نـهێنیی بریسـکانەوەی ئیعجـازی تریـان تێدایـە[1]. تەنانـەت زانایانی زانیاریی "نـهێنیی پیتـەکان" و ئـەولیا لێکۆڵـەرەکان گەلـێ نـهێنیی زۆریـان لـەم پیتـە پچڕپچڕانە دەرهێناوە و، هێندە حەقیقەتی مـەزنیان تێدا دیـوە کـە لـە لایـان چەسپاوە ئەم پیتـە پچڕپچڕانە لـە خۆیـاندا موعجیزەیـەکی درەخشـانی قورئـانی پـیرۆزن! بـەڵام ئێمـە لـێرەدا ئـەو دەرگایـە ناخەینـە سەرپشـت، چونکـە شـایانی نهێنییـەکانی ئـەوان نیـین، وێـڕای ئـەوەی کـە ناشتوانین بە جۆرێکی وا بیچەسپێنین کە هەموان بتوانن بیبینـن. بـەڵکو خوێنـەر ڕەوانـەی ئـەو پێنج شـەش بریسکانەوەی ئیعجازە دەکەین کە تایبەتن بەم پیتانەوە و لە "إشـارات الإعجـاز"دا باس کراون.

* * *

ئێستاش چەند ئاماژەیەك بۆ شێوازەکانی قورئانی پیرۆز دەکەین لـە ڕووی: (سـوورەت و، ئامانج و، ئایەت و، گوفتار و، وشەکانیەوە):

○ بۆ نموونە:

گەر بە وردی سەرنج لە سوورەتی "النبأ": ﴿عَـــمَّ يَتَسَـــاءلُونَ﴾ تـا کۆتـایی سـوورەتەکە بدرێـت، ئـەوا دەردەکـەوێت کـە: وەسـفی ئـەحواڵی دواڕۆژ و حەشـر و بەهەشـــت و دۆزەخ دەکات و، بە شێوازێك دەیانچەسپێنێت کە دڵنیـایی و قەناعـەت بـە دڵان ببەخشـێت. چونکـە دەری دەخات کە هەرچی کاروباری خوایی و ئاسەواری پـەروەردگاری لـەم دنیایـەدا هـەن، ڕوویان لە حاڵەت و بارودۆخەکانی ئەودنیایە.

جا لـەبەر ئـەوەی ڕوونکردنـەوەی شـێوازی سەرانسـەری سـوورەتەکە درێـژە دەکێشـێت، ئەوا تەنها ئاماژە بۆ یەك دوو خاڵی دەکەین:

ئەم سوورەتە لە سەرەتاوە بۆ مەبەستی چەسپاندنی ڕۆژی قیامەت دەفەرموێ:

زەویمان بۆ کردوون بـە لانـك و وەك ڕایـەخێکی جـوان و ڕەنگـین بۆمـان ڕاخستوون و.. چیاکانیشمان بە وێنەی ستوون و مێخ بۆ داکوتاون و پڕمان کـردوون لـە چـەندەها گەنجینـەی پێویست بۆ ژیان و خانە و لانە و نیشتەجێکانتان.. ئێوەشمان بە نـێر و مـێ و هاوسـەری یـەکتر بـەدی هێنـاوە بـە چەشـنێ کـە یـەکترتان خـۆش دەوێـت و دڵتـان بـە یـەکتری دەکرێتـەوە..

---

(١) نووسەر باسێکی گەلـێ ورد و ناوازەی لەم بارەیەوە نووسیوە. بڕوانە بـۆ کتێبی: "اشـارات الاعجاز" ص ٥٠-٥٥ی چاپەکەی بەغدا، ص ٤١-٤٤ی چاپـە تازەکـەی ئەستەمبووڵ و قاهـیرە، ص ٣١-٣٦ی چاپـە تازەکـانی تـری پێش ئەم دوو چاپە. (وەرگێڕ)

شەویشمان وەك پەردە بەسەرتاندا داداوەتەوە تاكو تیایدا بحەوێنەوە و.. ڕۆژیشمان بۆ كردوون بە مەیدانی هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ڕۆزی و گوزەرانتان و.. خۆریشمان بە وێنەی چرایەكی ڕووناكی بەخش و ئاگردانێكی گەرمو گوڕ بۆ داگیرساندوون و.. لە هەورەكانیشەوە وەك كانیاو ئاوێكی ژیان بەخشمان بۆ باراندوون و.. لە ئاوێكی سادەش - بەوپەڕی ئاسانی - چەندین گوڵ و بەروبوومی جۆراوجۆرتان بۆ دروست دەكەین كە ڕۆزیی ئێوەیان هەڵگرتووە..

كەواتە ڕۆژی "فصل" - كە قیامەتە - چاوەڕێتانە و، هێنانی ئەو ڕۆژە بۆ توانستی ئێمە كە ئەم كارانە دەكەین، كارێكی گەلێ ئاسانە.

دوای ئەمە، ئاماژەیەكی پەنهانیش بۆ چەسپاندنی ئەو كارانە دەكات كە لە قیامەتدا ڕوو دەدەن، وەك:

ڕۆشتن و وردوخاش بوونی چیاكان و.. درزتێ‌بوون و لەت بوونی ئاسمانەكان و.. خۆ ئامادەكردنی دۆزەخ و.. بەخشینی باخچە ڕەنگینەكانی بەهەشتیش بە دانیشتووانی. وەك ئەوەی بڵێت: ئەو كەسەی لە بەرچاوی خۆتاندا ئەم هەموو كارانە لە چیاكان و گۆی زەوی‌دا ڕادەپەڕێنێت، بە هەمان جۆر لە دواڕۆژیشدا كاری ئاوا ئەنجام دەدات.

ئەوەتا باسكردنی چیاكان لە سەرەتای سوورەتەكەدا ئاماژە بۆ باروودۆخی چیاكان دەكات لە دواڕۆژدا و، ئەو باخچانەش كە لە پێشەكیی سوورەتەكەدا هەن ئاماژە بۆ باخچەكانی بەهەشت دەكەن لەو دنیادا.

بۆ خۆت حاڵەكانی تر لەسەر ئەمەی باس كرا قیاس بكە، تاكو بەرزی و مەودای ناسك و نیانیی شێوازی قورئانت بۆ دەربكەوێت.

○ نموونەیەكی تر:

**﴿قُلِ اللَّهُمَّ مالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَديرٌ ۞ تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهارِ وَتُولِجُ النَّهارَ فِي اللَّيلِ وَتُخرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَنْ تَشاءُ بِغَيْرِ حِسابٍ﴾** (آل عمران:٢٦-٢٧).

ئەم ئایەتە بە شێوازێكی بەرز و بڵند: كاروبارەكانی خواوەند لە گرۆی ئادەمیزاددا و.. دەروشانەوە خواییەكان لە بەدوای یەكدا هاتنی شەو و ڕۆژدا و.. تەسەرروفاتە پەروەردگاری‌یەكان لە وەرزەكانی ساڵدا و.. كار بەڕێ‌كردنەكانی پەروەردگار لە: ژیان و مردن و حەشر و نەشری دنیایی ڕووی زەوی‌دا، دەردەخات.

ئەم شێوازە هێندە بەرز و ناوازەیە كە زیریی كەسانی هۆشمەند و زیرەك بۆ تێڕامان و بیركردنەوە ڕاپێچ دەكات.

جا لەبەر ئـەوەی ئـەم شێوازە بـەرزە هێنـدە ڕوون و درەخشـانە کـە بـە کـەمترین ڕوانـین و سەرنجدان دەردەکەوێت، ئەوا ئێستا دەرگای ئەو گەنجینەیە ناکەینەوە.

❍ نموونەیەکی تر:

﴿إِذا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ ❁ وَأَذِنَتْ لِرَبِّها وَحُقَّتْ ❁ وَإِذا الأَرْضُ مُدَّتْ ❁ وَأَلْقَتْ ما فيـــها وَتَخَلَّتْ ❁ وَأَذِنَتْ لِرَبِّها وَحُقَّتْ﴾ (الإنشقاق:١-٥).

ئـەم ئایەتانـە بـە شێوازێکی بـەرز و بلنـد مـەودای گوێڕایـەڵی و ملکـەچیی ئاسمانـەکان و زەوی بۆ فەرمانەکانی خواوەند دەردەخەن..

چونکـە هــەروەك ســەرکردەیەکی مــەزن بــۆ ڕاپــەڕاندنی داخوازییــەکانی کاروبــاری "جیهاد" دوو فەرمانگـەی سـەربازی دادەمـەزرێنێت، وەك فەرمانگـەکانی مەشـق و جیـهاد و.. فەرمانگەکانی تەجنید و جەمکردنی موجاهیدان.. پاشان هەر ئەوەندەی کاتی مەشق و جیهاد کۆتـایی پێ دێـت، ئـەو دوو فەرمانگەیـەی کــە ئــەرکی سەرشـانیان تـەواو بــووە لــە چــەند کاروبارێکی تردا دەخاتە کار. وەك بڵێی لەم کاتەدا هەریەك لەم دوو جۆرە فەرمانگانە، چ بــە زمــانی کارمــەند و خزمــەتگوزارەکانیان و، چ بــە زمــانی خۆیــان – گــەر بدوێــن – بــەو ســەرکردەیەیان دەڵێن: (ئەی پێشـــەوای مـەزنمان! کـەمێك مۆڵـەتمان بـدە بـا خۆمـان ئامـادە بکــەین و بارودۆخــمان بسـازێنین و ئـەم شـوێنە لـە پاشمـاوەی کارەکـانی پێشـوومان خــاوێن بکەینەوە و ئەم پاشماوانە فڕێ بدەینە دەرەوە.. ئنجـا بـە فـەرمانی خـۆت شـەرەفمەندمان بکـە). پاشـان هەریەکـە لـەو دوو چەشنە فەرمانگانـە دەڵێن: (وا ئێستا ئـەو پاشماوانـەمان فـڕێ دایـە دەرەوە و، ئێستا ئامادە و ملکەچی فەرمانەکانتین، چ کارێکمان پێ دەسپێریت گوێڕایـەڵین. هەرکارێك تۆ بیکەیت ڕەوا و خێر و جوانە).

هەروەك ئەم نموونەیە ئاوایە، ئاسمانـەکان و زەویـش بـە هـەمان جـۆرن، دوو فەرمانگـەن بـۆ "تەکلیف" و "تاقیکردنەوە" دامەزرێنراون. جا هەرکات ماوەی کارەکەیان تەواو دەبێـت، بـە فـەرمانی خـوای گـەورە خۆیـان لـە هـەموو ئـەو شـتانە خـاڵی و بـەتاڵ دەکەنـەوە کـە سـەر بـە فەرمانگەی "تەکلیف"ن و، دەڵێـن: ئـەی پـەروەردگارمان لـە چ کـارێکدا دەتـەوێت فـەرموو بەکارمان بهێنە، چونکە گوێڕایەڵی کردنت حەقێکی واجبە لە سەرمان و، هەرکارێك کە تۆ دەیکەیت سەرتاپا حەق و ڕەوایە.

دەسا فەرموو بە وردی سەیری ئەم شێوازە دەراسایەی ئەم ڕستانە بکە.

❍ نموونەیەکی تر:

﴿يا أَرْضُ ابْلَعِي ماءَكِ وَيا سَماءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْماءُ وَقُضِيَ الأَمْرُ واسْتَوَتْ عَلى الْجُــودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (هود:٤٤).

وا بەم شـێوەیەی خـوارەوە و لـە ئاوێنـەی نموونەهێنانـەوەدا ئامـاژە بـۆ دڵۆپێـك لـە دەریـای ڕەوانبێژیی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکەین، تاکو شێوازێکی ڕوون بکەینەوە:

هەروەك سەرکردەیەکی مەزن لە جەنگێکی گشتی و جیهانیدا و پاش بەدەستهێنانی سەرکەوتن، فەرمان بۆ سوپایەکی دەردەکات و دەڵێت: "ئیتر تەقە مەکەن".. بە سوپاکەی دیکەی دەڵێت: (هێرش ڕابگرن). جا لەو کاتەدا کە تەقە و هێرش ڕادەوەستێت، ڕوویان تێدەکات و پێیان دەڵێت: (هەموو شتێك کۆتایی پێهات و، بەسەر دوژمناندا سەرکەوتین و، ئالای خۆمان بەسەر لووتکەی قەڵاکانیاندا هەڵکرد و، ئەو ستەمکار و خراپکارانەش بە سزای خۆیان گەیشتن و ملیان شکاند)!

بە هەمان جۆر، ئەو پادشایەش کە هەرگیز دژ و نەیار و هاووێنەی نییە، فەرمانی لەناوبردنی قەومی نووحی بۆ ئاسمانەکان و زەوی دەرکردووە. ئەوانیش کە فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد، ئەم پادشایە ڕووی تێکردن و فەرمووی: (ئەی زەوی! ئاوەکەت قووت بدە و، تۆش ئەی ئاسمان! دەست لە باران هەڵگرە و هێور بەرەوە، چونکە ئەرکی سەرشانتان کۆتایی پێ هات). یەکسەر دوای ئەم فەرمانە ئاوەکە کشایە دواوە و کەشتیی کارگوزاری "ئیلاهی"ش بە وێنەی خێوەتی هەڵدراو لەسەر چیایەك نیشتەوە و ستەمکارانیش بە سزای خۆیان گەیشتن!

دەسا فەرموو سەیری بلندیی ئەم شێوازە بکە، ئەوەتا زەوی و ئاسمان بە وێنەی دوو سەربازی گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانەکان، دەردەخات!

ئەم ئایەتە پیرۆزە، بەم شێوازەی، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بوونەوەران و ئاسمانەکان و زەوی ڕقیان لە بێ گوێیی و ملنەدانی مرۆڤە. بەم ئاماژەیەشی دەفەرموێ: (ئەو کەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن، نابێ گوێڕایەڵیی بۆ نەکرێ) دیارە ئەمەش سەرزەنشتێکی توندە بۆ مرۆڤ و، ڕێنماییە بۆی، تا لەو ملنەدانە ڕزگاری بکات.

دەبینیت ئەم ئایەتە پیرۆزە بە باس و لێدوانێکی پوختی جوانی خاوەن ئیعجاز و بە چەند ڕستەیەکی کەم، ڕووداوی ئەو تۆفانەی کە گشتی و هەمەلایەنە بووە، هاودەم لەگەڵ سەرجەم ئەنجام و ڕاستییەکانیدا، کۆ کردووەتەوە.

بۆ خۆت دڵۆپەکانی تری ئەم دەریایە، لەسەر ئەم دڵۆپە قیاس بکە.

ئێستاش بۆ ئەو شێوازە بڕوانە کە قورئانی پیرۆز لە پەنجەرەی وشەکانیەوە پیشانی دەدات:

❍ بۆ نموونە:

سەیری وشەی: ﴿**كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ**﴾ بکە لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿**وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ**﴾دا (یس:٣٩) با بزانیت کە چۆن شێوازێکی لەوپەڕی ناسکیدا پێشچاو دەخات، چونکە:

"مانگ" مەنزڵێکی تایبەتیی خۆی هەیە کە بازنەی "ثُرَّیــا"یە. جا کاتێك کە مانگ لەو مەنزڵەدا وەکو دەمەداس (هلالي) دەبێت، ئەوا شێوەی لە پەلی وشکی دارخورما دەچێت کە گەڵاکانی لێ کرابێتەوە و ڕەنگی سپی بنوێنێت.

ئەم ئایەتە پیرۆزە، بەم تەشبیهەی باس کرا، وا دەخاتە پێش‌چاوی ئەندێشەی بیسەر کە: لە پشت پەردەی ئاسمانی شینەوە درەختێك هەبێت یەکێك لە پەلە نوورانی و سپی و نووك تیژەکانی ئەو پەردەیەی دربێت و سەری لێ هێنابێتە دەرەوە و، کومەڵە ئەستێرەی "سورەییا"ش وەك هێشوویەکی هەڵواسراوی ئەو درەختە وابێت و، ئەستێرەکانی تریش وەك بەروبوومە نوورانی‌یەکانی تری وابن!

بێ گومان باسکردنی "هیلال" بەم تەشبیهە بۆ کەسانێك کە سەرچاوەی گوزەران و زۆربەی بژێویان لەسەر دارخورما بێت، لەوپەڕی جوانی و ناسکی و گونجاوی و بڵندی‌دایە. گەر خاوەنی چێژی ناسك و هەستیار بیت، پەی بەمە دەبەیت.

❍ نموونەیەکی تر:

وشەی: ﴿تَجْرِي﴾ لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا﴾ (یس: ٣٨) پەنجەرەی شێوازێکی بەرز و بڵند دەخاتە سەرپشت، وەك لە کۆتایی وتەی نۆزدەهەمدا چەسپێنراوە. چونکە:

وشەی: ﴿تَجْرِي﴾ کە واتای سووڕانەوەی خۆر دەگەیەنێت، بە یادخستنەوەی هەڵسوکەوتە ڕێکوپێکەکانی توانستی خواوەند لە سووڕانەوەی هاوین و زستان و بەدوای یەکدا هاتنی شەو و ڕۆژدا، مەزنیی کردگاری شکۆمەندمان تێ دەگەیەنێت و، سەرنجی خەڵکیش بۆ لای ئەو نووسراوە صەمەدانی‌یانە ڕادەکێشێت کە قەڵەمی توانستی خوای گەورە لەسەر لاپەڕەی وەرزەکاندا نووسیونی. بەمەش خەڵکی لە حیکمەتی بەدیهێنەری شکۆمەند شارەزا دەکات.

هەروەها کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجاً﴾ (نوح:١٦) واتە: (خۆری وەك چرا لێ کردووە)، بە دەستەواژەی ﴿سِرَاجاً﴾ پەنجەرەیەك لەسەر ئەم چەشنە شێوازە دەکاتەوە. چونکە:

ئەم شێوازە ئەوە دەخاتەوە یادی ئادەمیزاد کە ئەم جیهانە وەك کۆشکێك وایە و، شمەك و خواردەمەنی و ئارایشتەکانی ناویشی بۆ مرۆڤ و گیانلەبەران ئامادە کراون و، "خۆر"یش لەم کۆشکەدا وەك چرایەکی داگیرساوی ملکەچ و دەستەمۆ وایە..

قورئانی پیرۆز، بەم شێوازە، مرۆڤ لە گەورەیی و چاکەکاریی بەدیهێنەر تێ‌دەگەیەنێت و، بەڵگەیەکی لەسەر "تەوحید" پێش‌چاو دەخات. چونکە ئەو خۆرەی کە موشریکان لەو گومانەدان مەزنترین و درەوشاوەترینی پەرستراوەکانیانە، لە ڕاستی‌دا جگە لە چرایەکی ملکەچ و بەدیهاتوویەکی بێ گیان، هیچی‌تر نی‌یە.

کەواتە بەکارهێنانی وشەی: ﴿سِـــراجاً﴾ لەم دەربڕینەدا، مرۆڤ بۆ سۆز و بەزەیی بەدیهێنەر لە نێوان گەورەیی پەروەردگارییەکەیدا بێدار دەکاتەوە و، چاکەکارییەکانی ئەو خواوەندەش لە نێوان فراوانیی میهرەبانییەکەیدا لە مرۆڤ دەگەیەنێت و، وایان لێ دەکات هەست بەو سەخاوەتمەندییەی خواوەند بکەن کە لە ناوەندی گەورەیی دەسەڵاتی ئەودا هەیە و، بەم هەست پێ کردنەش "وەحدانییەت"یان تێ دەگەیەنێت. وەك ئەوەی پێیان بڵێت: چرایەکی ملکەچ و بێ گیان، هەرگیزاوهەرگیز شایستەی پەرستن نییە!

پاشان باسکردنی جوولەی "خۆر" بە دەستەواژەی: ﴿تَجْـــرِي﴾ گەلێ هەڵسوکەوتی ڕێکوپێك و سەرسووڕهێنی لەمەڕ: سووڕان و نوێ بوونەوەی زستان و هاوین و شەو و ڕۆژ یاد دەخاتەوە و، بەم یادخستنەوەیەش گەورەیی توانستی ئەو کردگارەمان تێ دەگەیەنێت کە تاك و بێ‌هاوتایە لە پەروەردگارێتیی خۆیدا.

بەو واتایەی کە ئەم دەستەواژەیە زەینی مرۆڤ لە خۆر و مانگەوە دەگوێزێتەوە بۆ لاپەڕەکانی شەو و ڕۆژ و زستان و هاوین، لەمەشەوە سەرنجی بۆ لای دێڕەکانی ئەو ڕووداوانە ڕادەکێشێت کە لەسەر ئەو لاپەڕانەدا نووسراون.

بەڵێ، قورئان لەبەر خودی "خۆر" لە خۆر نادوێت، بەڵکو لەبەر ئەو کەسەی کە ڕووناکیی داوەتێ و کردوویەتی بە چرا، لێی دەدوێت.. هەروەها لە ماهییەتی خۆر ناکۆڵێتەوە کە مرۆڤ پێویستی پێی نییە، بەڵکو لە بارەی فەرمانبەرییەکەی دەکۆڵێتەوە کە لەوەدایە ئەرکی زەمبەلەکی خراوەتە ئەستۆ بۆ ڕێکخستنی سنعەتی پەروەردگار و، کراوە بە مەڵبەندێك بۆ ڕێسای بەدیهاتووانی و، قورمیشێك بۆ لەگەڵ یەك سازاندنی سنعەتەکانی، لەو شتانەدا کە وێنەکێشی ئەزەلی بە تاڵ و دەزووی شەو و ڕۆژ دەیانچنێت.

دەتوانیت بۆ خۆت وشەکانی تری قورئان بۆ سەر ئەمانە قیاس بکەیت. چونکە هەرچەند وشەکانی بە ڕواڵەت وەك وشەی لەگەڵ ڕاهاتووی ئاسایی لە بەرچاودا دەنوێنن، کەچی لە ڕاستیدا هەریەکەیان ئەرکی چەند کلیلێکیان خراوەتە ئەستۆ بۆ کردنەوەی گەنجینەکانی گەلێ واتای ناسك و نیان.

بەم جۆرە و لەبەر بڵندیی شێوازی قورئانە - وەك لە زۆربەی ئەم ڕووانەی پێشوودا دەرکەوت - کە جاری وا بووە عەرەبێکی دەشتەکی شەیدای گوفتارێکی ئەم قورئانە دەبوو و، پێش ئەوەی ئیمان بهێنێت سوژدەی دەبرد! وەك دەگێڕنەوە کە یەکێك لەو دەشتەکییانە هەر کە ئایەتی پیرۆزی: ﴿فَاصْدَعْ بِما تُؤْمَر﴾ (الحجـر:٩٤) بەرگوێی کەوتووە، یەکسەر سەری سوژدەی لە زەوی ناوە، کە لێیان پرسیوە: ئایا موسڵمان بوویت؟ وتوویەتی: نەخێر، بەڵام سوژدەم بۆ ڕەوانبێژیی ئەم گوفتارە برد!

● **خاڵی چوارەم:**

**زمانپاراوی(فصاحة)ی دەراسای "وشەكانی" قورئان.**

بەڵێ، هەروەك قورئانی پیرۆز لە ڕووی شێواز و دەربڕینی واتاكانیەوە دەری "ڕەوانبێژی"یەكی دەراسا و بێ وێنەیە، لە وشەكانیشیدا لەوپەڕی ڕەوانی و "زمانپاراوی"دایە. بەڵگەی گومانبڕیش لەسەر زمانپاراویی وشەكانی قورئان ئەوەیە كە هەرچەندە بیانخوێنیتەوە و لەگەڵیاندا مامەڵە بكەیت هێشتا هەر لێیان بێزار نابیت، هەروەك شایەتیی زانایانی زانستەكانی "گوزارەكاری و ڕەوانكاری"(المعاني والبيان)یش بەڵگەیەكی درەخشانن لەسەر حیكمەتی زمانپاراویی وشەكانی قورئان.

بەڵێ، گەر هەزاران جاریش قورئان دووپات بكرێتەوە، هێشتا هەر مرۆڤ بێزار ناكات. بەڵكو بەو دووپاتبوونەوەیە پتر چێژ و شیرینیی قورئان دەچێژێت. تەنانەت زەینی منداڵی بچووكیش ئەم قورئانە پیرۆزەی بەلاوە گران نییە، ئەوەتا بەوپەڕی ئاسانی دەتوانێت لەبەری بكات! خۆ ئەو كەسەش كە بە دەردێكی سەختەوە گیرۆدە بووە و لە هەموو قسە و گوفتارێكی تەنانەت سووكەڵە و كەمیش بێزار دەبێت، هەرگیز لە بیستنی ئەم قورئانە بێزار نابێت، بەڵكو لەزەتێكی تایبەتیی لێ دەچێژێت. سەبارەت بەو كەسەش كە لە سەرەمەرگدایە و لە هەموو شتێك بێزارە، ئەوا بە وێنەی سازگاریی ئاوی زەمزەم لە دەمدا . ئەم قورئانەی لە لا شیرینە و بە مێشك و گوێی ئاشنا و سازگارە.

حیكمەتی بێزار نەبوونی مرۆڤ لە قورئانی پیرۆز، لەوەدایە كە:

قورئانی پیرۆز خۆراك و بژێوی "دڵان" و.. هێز و خواستی "ژیرییەكان" و.. ڕووناكی و ئاوی "گیانەكان" و.. دەرمان و شیفای "دەروونەكان"ە. كەواتە هەرگیز نابێزرێت و وەكو نان وایە كە ڕۆژانە دەیخۆین و لێی بێزار نابین، لە كاتێكدا كە ئەگەر ڕۆژانە خۆشترین میوە بخۆین، لە ئەنجامدا لێی بێزار دەبین و لە بەرچاومان دەكەوێت!

واتە لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز: حەق و، حەقیقەت و، ڕاستی و، هیدایەتە و، خاوەنی زمانپاراویی دەراسایە، ئەوا هەرگیز بێزاری بەرهەم ناهێنێت، بەڵكو هەمیشە پارێزگاریی جوانی و لاویی خۆی دەكات بە وێنەی پارێزگاری كردنی شیرینی و پاراویيەكەی. تەنانەت كاتێ كە یەكێك لە سەركردە و ڕەوانگۆیانی قورەیش بۆ بیستنی قورئان ڕۆشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ویستی بزانێت ئەم قورئانە چییە، دوای بیستنی هاتەوە و، وتی: (بە خوا تامی ئەم قورئانە شیرینە و، جوانیی پێوە دیارە و، هەرگیز گوفتاری مرۆڤ نییە). پاشان بە قەومەكەی خۆی وت: (بە خوا كەستان تێدا نییە وەكو من شارەزای شیعری ئادەمیزاد و جینني بێت، بە خوا ئەوەی ئەو دەیلێت هەرگیز لەمانە ناچێت)! بۆیە هیچ ڕێگا چارەیەكیان لە بەردەمدا نەمایەوە مەگەر ئەوەی كە بە پێغەمبەر ﷺ بڵێن: كابرایەكی ساحیرە. تاكو بەم فێڵە شوێنكەوتووانیان لەخشتە بەرن و لە پێغەمبەر ﷺ دووریان بخەنەوە!

بەم جۆرە سەرسەختترینی دوژمنانیش لە بەردەم زمانپاراویی قورئاندا، حەپەسان و واقیان ورما و دەمیان بوو بە تەڵەی تەقیو!

ڕوونکردنەوەی هۆکارەکانی "زمانپاراوی" لە ئایەت و گوفتار و ڕستەکانی قورئانی پیرۆزدا، گەلێ درێژە دەکێشێت. جا لەبەر ئەوەی درێژەی پێ نادەین، ئەوا بۆ نموونە بریسکەیەکی ئیعجاز پیشان دەدەین کە لە بارودۆخ و چۆنێتیی پیتە هیجائیەکانی تەنها یەك ئایەتەوە دەبریسکێتەوە، کە بریتییە لە ئایەتی:

﴿ثُمَّ أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُعاساً يَغْشى طائِفَةً مِنْكُمْ وَطائِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنْفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِاللهِ غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجاهِلِيَّةِ يَقُولُونَ هَل لَّنا مِنَ الأَمْرِ مِنْ شَيْءٍ قُلْ إِنَّ الأَمْرَ كُلَّهُ للهِ يُخْفُونَ في أَنْفُسِهِمْ ما لا يُبْدُونَ لَكَ يَقُولُونَ لَوْ كانَ لَنا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنا ههُنا قُلْ لَوْ كُنْتُمْ في بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذينَ كُتِبَ عَلَيهِمُ الْقَتْلُ إِلى مَضاجِعِهِمْ وَلِيَبْتَلِيَ اللهُ ما في صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ ما في قُلُوبِكُمْ واللهُ عَليمٌ بِذاتِ الصُّدُورِ﴾ (آل عمران:١٥٤).

ئەم ئایەتە پیرۆزە هەموو پیتەکانی "هجاء" و جۆر و ڕەگەزی پیتە قورسەکانی لە خۆدا کۆکردووەتەوە، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا ڕەوانیی خۆی لەدەست نەداوە! بەڵکو سەرباری جوانیی خۆی، پتر جوانیی پێ بەخشیوە و ئاوازێکی زمانپاراویشی ئاوێتە کردووە کە لە چەند ژێ(أوتار)یەکی گونجاوی جۆراوجۆرەوە هەڵقوڵاوە..

فەرموو بە وردی سەیری ئەو بریسکەی ئیعجازە بکە:

"ئەلف" و "یاء" لەبەر ئەوەی سووکترینی پیتە هیجائییەکانن و بە وێنەی دوو دانە برا جارجار لەگەڵ یەکتریدا جێ دەگۆڕنەوە، ئەوا هەریەکەیان بیست و یەك جار لەم ئایەتەدا دووپات بوونەتەوە.. ئنجا لەبەر ئەوەی "میم" و "نوون"[1]یش برای یەکترین و دەکرێ لە جێی یەکتردا دابنیشن، ئەوا هەر یەکەیان سی و سێ جار دووپات بوونەتەوە.. پاشان "صاد" و "سین" و "شین" بەپێی مەخرەج و سیفەت و دەنگ، برای یەکترین، دەبینی هەریەکەیان سێ جار لەم ئایەتەدا بەکارهێنراون.. "عەین"و "غەین"یش کە برای یەکترین دەبینی یەکەمیان کە پیتی "عەین"ە شەش جار دووپات بووەتەوە چونکە بەکارهێنانی لەسەر زماندا سووکە، کەچی پیتی "غەین" لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی قورسە سێ جار واتە نیوەی براکەی بەکار هاتووە. "تاء" و "ظاء" و "ذال" و "زای" لە ڕووی مەخرەج و سیفەت و دەنگەوە، برای یەکترین، بۆیە هەموو یەکێکیان دوو جار بەکار هێنراون.. "لام" و "ئەلف"یش کە لە شێوەی "لا"دا یەك دەگرن، بەشی "ئەلف" نیوەی بەشی "لام" دەبێت، بۆیە لەم ئایەتەدا چل و دوو جار "لام" بەکار هێنراوە، کەچی "ئەلف" بە نیوەی ئەو: بیست و

(١) "تەنوین"یش هەر نوونە. (دانەر)

یه‌ك جار به‌كار هێنراوه‌.. "هه‌مزه‌" و "هاء"یش به‌پێی مه‌خره‌ج برای یه‌كترن، ده‌بینی "هه‌مزه‌" سیازده‌ جار[1] و "هاء"یش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به‌ یه‌ك پله‌ له‌و سووكتره‌ چوارده‌ جار دووپات بوونه‌ته‌وه‌.. "قاف" و "فاء" و "كاف"یش بران، جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی "قاف" نوخته‌یه‌كی زیاتره‌ ئه‌وا ده‌ جار، كه‌چی "فاء" و "كاف" یه‌كی نۆ جار به‌كار هاتوون.. "باء"یش نۆ جار و "تاء"یش دوازده‌ جار به‌كار هاتووه‌ چونكه‌ سێ پله‌ی هه‌یه‌.. خۆ "ڕاء"یش بۆ "لام"ه‌ كه‌چی به‌پێی حسابی "ئه‌بجه‌دی"، "ڕاء" دووسه‌ده‌ و "لام"یش سی، واته‌ "ڕاء" به‌ شه‌ش پله‌ له‌ سه‌رووی لامه‌وه‌یه‌، بۆیه‌ لێره‌دا به‌ شه‌ش پله‌ له‌و خوارتره‌، هه‌روه‌ها "ڕاء" گه‌لێ جار له‌ قسه‌ و گوفتاردا دووپات ده‌بێته‌وه‌ و ڕه‌زای گران ده‌بێت بۆیه‌ ته‌نها شه‌ش جار به‌كار هاتووه‌.. "خاء" و "حاء" و "ثاء" و "ضاد" له‌سه‌ر زماندا قورسن و په‌یوه‌ندیشیان له‌ نێواندا هه‌یه‌، بۆیه‌ هه‌ر یه‌كه‌یان یه‌ك جار به‌كار هێنراوه‌.. ئنجا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی "واو" له‌ "هاء" و "هه‌مزه‌" سووكتر و له‌ "یاء" و "ئه‌لف"یش قورستره‌، ئه‌وا حه‌ڤده‌ جار، واته‌ چوار پله‌ له‌ سه‌رووی "هه‌مزه‌ی ثه‌قیله‌" و چوار پله‌ش له‌ خوار "ئه‌لفی خه‌فیفه‌"وه‌ به‌كار هێنراوه‌.

جا ئه‌م پیتانه‌، به‌م بارودۆخه‌ ڕێكوپێكه‌ ده‌راسا و، په‌یوه‌ندی‌یه‌ نادیارانه‌ و، له‌گه‌ڵ ئه‌و ڕێكوپێكی‌یه‌ جوان و ڕێسا ورد و پێكه‌وه‌ گونجانه‌ ناسكه‌دا، به‌ دڵنیایی‌یه‌كی بێ گومانی چه‌شنی: دوو كه‌ڕه‌ت دوو ده‌كاته‌ چوار، ده‌یچه‌سپێنێت كه‌ كاری مرۆڤ نی‌یه‌ و هه‌رگیز ئاده‌میزاد ناتوانێت ئه‌نجامی بدات. خۆ مه‌حاڵیشه‌ "ڕێكه‌وت" سه‌ر له‌ ورده‌كاریی ئاوا ده‌ربكات و یاریی پێ بكات!

جا هه‌روه‌ك ئه‌م ڕێكوپێكی‌یه‌ سه‌رسووڕهێن و ڕێسا نامۆیه‌ی بارودۆخی ئه‌م پیتانه‌، مایه‌ی زمانپاراوی و ڕه‌وانیی وشه‌كانی ئه‌م ئایه‌ته‌ن، ده‌گونجێ جگه‌ له‌مانه‌، گه‌لێ حیكمه‌تی تریشیان تێدا بێت.

جا مادەم ئه‌م ڕێكوپێكی‌یه‌ له‌م وشانه‌دا هه‌یه‌، ئه‌وا بێ گومان ڕێكخستنێكی پڕ له‌ نهێنی و گونجاندنێكی ڕووناكی ئه‌وتۆ له‌ وشه‌ و ڕسته‌ و واتاكانی‌دا ڕه‌چاو كراوه‌، كه‌ ئه‌گه‌ر چاو بتوانێت بیبینێت له‌ سه‌رسووڕماندا ده‌ڵێت: "ماشاء الله" و، گه‌ر "عه‌قڵ"یش بتوانێت په‌یی پێ ببات ئه‌وا له‌ حه‌په‌ساندا ده‌ڵێت: "بارك الله"!

● **خاڵی پێنجه‌م:**

**ته‌واویی ڕه‌وانكاری (براعة البيان).**

واته‌: ته‌فه‌ووق و توندوتۆڵی و سام و هه‌یبه‌ت. چونكه‌ هه‌روه‌ك پاراوی له‌ هۆنینی قورئاندا و، فه‌صاحه‌تیش له‌ وشه‌كانی‌دا و، ڕه‌وانبێژی له‌ واتاكانی‌دا و، ناوازه‌یی له‌ شێوازی‌دا هه‌یه‌.. به‌ هه‌مان جۆر ته‌واوی‌یه‌كی له‌ ڕاده‌به‌ده‌ر له‌ "ڕه‌وانكاری"یشی‌دا هه‌یه‌.

---

(١) ئه‌و هه‌مزه‌یه‌ی كه‌ ته‌له‌ففوز ده‌كرێت و ئه‌وه‌ش ناكرێت بیست و پێنج جاره‌ و، سێ پله‌ له‌ سه‌رووی براكه‌یه‌وه‌یه‌ كه‌ "ئه‌لفی ساكینه‌"یه‌. چونكه‌ "حه‌ره‌كه‌" سیانن. (دانه‌ر)

بەڵێ، "بەیان"ی قورئان لە بەرزترین پلـەی چینـەکانی ئاخـاوتن و بەشـەکانی گوفتاردایـە، چەشنی: تەرغیب و تەرهیب، مەدح و زەم، ئیسبات و ئیرشاد، ئیفهام و ئیفحام.

سوورەتی: "الإنسان" نموونەیەکی نێوان هەزارانی مەقامی "هـاندان و تەشـویق"ە، چونکـە "بەیان"ی قورئان لـەم سـوورەتەدا: ڕەوان و بـەخوڕە وەك سەلسـەبیل و.. بەتامـە وەك میـوەی بەهەشت و.. جوانە وەك پۆشاکی "حور العين"[1].

پێشەکیی سوورەتی "الغاشية"ش یەکێکـە لـە نموونـە بێسنوورەکانی مـەقامی "ترسـاندن و هەڕەشـە"! چونکـە "بـەیان"ی قورئـان لـەم سـوورەتەدا بـە وێنـەی کاریگـەریی قوڕقوشمـی بەکوڵهـاتوو لـە گـوێی گومڕایـان و.. بڵێسـەی ئاگـر لـەناو ژێری‌یاندا و.. زەقـووم لـە گەروویاندا و.. گڕەی دۆزەخ لە ڕوویاندا و.."ضَريع"ی دڕکاویش لە سکیاندا، کاریگەریی هەیە!

بەڵێ، لە کاتێکدا دۆزەخی کارمەندی سزادان، نزیك بێ لە ڕقدا شەق بەرێت: ﴿تَكَـادُ تَمَـيَّزُ مِـنَ الْغَيْـظِ﴾.. دەبێ هەڕەشەی ئەو کەسە چۆن بێت کە فەرمانی سزادانی بـۆ دەرکردووە؟!

هەروەها ئەو پێنج سوورەتەش کە بە ﴿الْحَمْـدُ للهِ﴾ دەست پێدەکەن، یـەك لـە هـەزارانی نموونەی مەقامی "مەدح"ن.

چونکە "بەیان"ی قورئان لەم سوورەتانەدا: وەك خۆر درەخشـان و[2].. وەك ئەستێرەکان ڕازاوە و.. وەك ئاسمانەکان و زەوی بەسام و.. وەك مەلائیکـەت خۆشەویسـت و هـاودەم و.. وەك بەزەیی‌هاتنەوەی مـرۆڤ بـە سـاوایان - لـەم دنیایـەدا - ناسـك و.. بـە وێنـەی بەهەشـتی نەرمونیانی ئەو دنیاش.. جوان و ڕازاوەیە!

ئەم ئایەتەی خوارەوەش، یەك لە هەزارانی نموونەی مەقامی "زەم و سەرزەنشت"ە:

﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ﴾ (الحجرات:١٢).

ئـەم ئایەتـە پیرۆزە، لـە شـەش پلـەدا، نـەهی لـە "غەیبـەت" دەکـات و، بـە سەرزەنشـتێکی توندوتیژ مرۆڤی لـێ دوور دەخاتەوە.

جا مادەم ڕووی گوفتار لـەم ئایەتـەدا ئاراستەی غەیبـەتکاران کـراوە، ئـەوا واتاکـەی بـەم جۆرە دەبێت:

ئەو "هەمزە"یەی کە لـە سـەرەتادایە بـۆ "ئیسـتیفهامی ئینکـاری"یـە، چونکـە حوکمـی ئـەم ئیسـتیفهامە وەك لافـاو دەڕژێتـە نـاو سـەرجەم وشـەکانی ئـەم ئایەتـەی کـە هـەموو یـەکێك لـە وشەکانی حوکمێکی لەخۆ گرتووە..

---

(١) ئەم شێوازە پۆشاکی واتاکانی خودی سوورەتەکەی پۆشیوە! (دانەر)

(٢) ئەم دەستەواژانە ئاماژەن بۆ بابەتەکانی ئەو سوورەتانە. (دانەر)

ئه‌وه‌تا ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه له‌ وشه‌ی یه‌كه‌مدا به "هه‌مزه" ڕووی گوفتار ده‌كاته ئاده‌میزاد و پێیان ده‌فه‌رموێ:

ئایا ئێوه خاوه‌نی "ژیری" نین - كه جێی لێپرسینه‌وه‌یه - تا له‌م كاره چه‌په‌ڵه تێ بگات؟

له وشه‌ی دووهه‌میشدا: ﴿أَيُحِبُّ﴾ به "هه‌مزه" پێیان ده‌فه‌رموێ:

ئایا ئێوه "دڵ"تان - كه جێی ڕق و خۆشه‌ویستی‌یه - سه‌ری لێ شێواوه، كه وای لێ هاتووه بێزراوترین شتی پێ‌خۆشه و سڵی لێ ناكاته‌وه؟

هه‌ر به "هه‌مزه" له وشه‌ی سێ‌هه‌میشدا: ﴿أَحَدُكُمْ﴾ پێیان ده‌فه‌رموێ:

ژیانی كۆمه‌ڵایه‌تی‌تان - كه له ژیانی كۆمه‌ڵه‌وه به‌هره‌مه‌ندی ژیان و حه‌یه‌وییه‌ت ده‌بێت - چیی لێ قه‌وماوه؟ بۆچی شارستانێتی‌یه‌كه‌تان هێنده له كاروان جێ ماوه كه به شتانێك ڕازی ده‌بێت ژیانتان ژه‌هراوی و ئاسووده‌ییشتان لێڵ بكات!

له وشه‌ی چواره‌م: ﴿أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ﴾یشدا، به "هه‌مزه" پێیان ده‌فه‌رموێ:

چ تیرێك مرۆڤایه‌تیی ئێوه‌ی پێكاوه، تا واتان لێ هاتووه به وێنه‌ی درنده هاوڕێ خۆشه‌ویسته‌كه‌تان به نێچیر ده‌زانن و كه‌وڵی ده‌كه‌ن؟

ئه‌م ئایه‌ته له وشه‌ی پێنجه‌میشدا: ﴿أَخِيهِ﴾ به‌و "هه‌مزه‌یه" ڕوویان تێ ده‌كات و ده‌فه‌رموێ:

ئایا به‌زه‌یی‌تان به هاوڕه‌گه‌زی خۆتاندا نایه‌ته‌وه؟ ئایا هیچ په‌یوه‌ندی‌یه‌كی سۆز و میهره‌بانی له نێواندا نی‌یه كه به‌یه‌كه‌وه بتانبه‌ستێت؟ تا واتان لێ هاتووه به‌رده‌بنه گیانی كه‌سێك كه له چه‌ند ڕوویه‌كه‌وه براتانه و، به دڵڕه‌قی گۆشتی كه‌سی مه‌عنه‌وی و سته‌م لێكراوی ئه‌و ده‌خۆن؟ گه‌ر كه‌سێك گاز له ئه‌ندامێكی خۆی بگرێت ئایا به مرۆڤێكی هۆشمه‌ند و ژیر داده‌نرێت؟ یان به شێتێكی نه‌فام؟!

هه‌ر به‌و "هه‌مزه"یه له وشه‌ی شه‌شه‌میشدا: ﴿مَيْتًا﴾ پێیان ده‌فه‌رموێ:

ویژدانتان له كوێ‌یه؟ ئایا سروشتی ئێوه هێنده گه‌نیوه په‌لاماری چه‌په‌ڵترین شتی نه‌فره‌ت لێ كراو بدات، كه خواردنی گۆشتی براكه‌تانه، له كاتێكدا كه شایانی هه‌موو ڕێزێكه؟

له‌م ئایه‌ته پیرۆزه‌وه و له‌و به‌ڵگه جۆراوجۆرانه‌ی وشه‌كانیشی كه باسمان كردن، ده‌رده‌كه‌وێت "غه‌یبه‌ت" له ڕووی: ژیری و، دڵ و، مرۆڤایه‌تی و، ویژدان و، سروشت و، ئایینه‌وه، كارێكی خراپی ناڕه‌وایه.

ده فه‌رموو بۆ خۆت بیر له‌م ئایه‌ته پیرۆزه بكه‌ره‌وه و، بزانه كه چۆن به ئیعجازێكی له ڕاده‌به‌ده‌ر و كورتكردنه‌وه‌یه‌كی زۆر پوخت و له شه‌ش پله‌دا، نه‌هی له تاوانی "غه‌یبه‌ت" ده‌كات!

ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه‌ی خواره‌وه‌ش نموونه‌یه‌كه له نێوان هه‌زاران نموونه‌ی مه‌قامی "چه‌سپاندن"دا..

﴿فَانْظُرْ إِلى آثارِ رَحْمَتِ اللهِ كَيْفَ يُحْيِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِها إِنَّ ذلِكَ لَمُحْيِ الْمَوْتى وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَديرٌ﴾ (الروم: ٥٠).

ئەم ئایەتە، بە ڕوونکردنەوەیەکی تێر و تەسەلی بێوێنە "حەشر" دەچەسپێنێت و، بەدوورزانینی لە زەیندا لا دەبات. چونکە وەك لە "ڕاستیی نۆهەمی وتەی دەهەم" و "بریسکانەوەی پێنجەمی وتەی بیست و دووهەم"دا چەسپاندوومانە:

هەر کە وەرزی بەهار دێت، دەڵێیت گۆی زەوی سەرلەنوێ گیانی بەبەردا دەکرێتەوە! بەوەی کە سێ‌سەد هەزار جۆری حەشر و نشوور، بە ڕێکوپێکیی ورد و لەیەك جیاکردنەوەی تەواوەتی، هەرچەندەش لەوپەڕی تێکەڵی‌دان، لە ڕووی زەوی‌دا، بەرجەستە دەبن. بە ڕادەیەك کە ئەو زیندووکردنەوەیە هەموو کەسێك بە چاوی خۆی دەیبینێت! وەك ئەوەی پێی بڵێت: ئەو کەسەی زەویی بەم جۆرە زیندوو کردووەتەوە، هەرگیز بەرپاکردنی حەشر و نەشری بەلاوە گران نی‌یە.

پاشان نووسینی ئەم هەزاران جۆرە زیندەوەرە بە قەڵەمی توانست لەسەر لاپەڕەی زەوی‌دا، بێ هیچ هەڵە و ناتەواوی‌یەك.. مۆرێکی ئاشکرای خواوەندی تاك و تەنیایە.

ئنجا هەروەك ئەم ئایەتە پیرۆزە "تەوحید"ی چەسپاند، "قیامەت و حەشر"یش دەچەسپێنێت و، دەری دەخات کە حەشر و نەشر سەبارەت بەو توانستەوە گەلێ ئاسانە و، وەك چەسپاوی و بێ گومانیی ئاوابوون و هەڵهاتنی خۆر وایە.

پاشان هەروەك ئەم ئایەتە پیرۆزە بە وشەی: ﴿كَيْفَ﴾ واتە لە گۆشەی "چۆنێتی"یەوە ئەم ڕاستی‌یەی دەرخستووە، گەلێ سوورەتی تریش هەن کە درێژەیان بەم چۆنێتی‌یە داوە. بۆ نموونە کە سوورەتی "ق" بە لێدوان و باسێکی بەرز و جوان و درەخشان حەشر و قیامەت دەچەسپێنێت، ئەوا دەری دەخات کە: هەروەك گومان لە هاتنی بەهاردا نی‌یە، هاتنی حەشریش بە هەمان جۆر گومانی تێدا نی‌یە. فەرموو بیر لەو وەڵامەی قورئانی پیرۆز بکەرەوە کە بۆ کافرانی داوەتەوە، لەوانەی کە ئینکاری‌یان نواندووە و سەریان لەوە سووڕماوە ئێسکەکان زیندوو بکرێنەوە و ببنەوە بە بەدیهاتوویەکی نوێ! ئەوەتا پێ‌یان دەفەرموێ:

﴿أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلى السَّماءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْناها وَزَيَّنَّاها وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ ۞ والأَرْضَ مَدَدْناها وأَلْقَيْنا فيها رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنا فيها مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهيجٍ ۞ تَبْصِرَةً وَذِكْرى لِكُلِّ عَبْدٍ مُنيب ۞ وَنَزَّلْنا مِنَ السَّماءِ ماءً مُبارَكاً فَأَنْبَتْنا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصيدِ ۞ والنَّخْلَ باسِقاتٍ لَهَا طَلْعٌ نَضيدٌ ۞ رِزْقاً لِلْعِبادِ وَأَحْيَيْنا بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً كذلكَ الْخُرُوجُ﴾ (ق:٦-١١).

ئەم "بەیان"ەی قورئان، وەك ئاوی بەخوڕ لەبەری دەڕوات و.. بە وێنەی ئەستێرە پڕشنگدارەکان درەخشانە و.. خۆراکێکی بەتام و شیرینی وێنەی "خورما"ش دەرخواردی "دڵ" دەدات و، هەروەك چێژە، لە هەمان کاتدا خۆراکیشە بۆ ڕۆحی مرۆڤ.

یه‌كێك له‌ نموونه‌ هه‌ره‌ ناسكه‌كانی مه‌قامی "چه‌سپاندن" ئه‌م نموونه‌یه‌ی خواره‌وه‌یه‌:

﴿يس ۞ وَالْقُرآنِ الْحَكِيمِ ۞ إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ (يس:١-٣).

ئه‌م سوێنده‌، به‌ یه‌قینێكی بێ گومان و حه‌قێكی ئاشكرا، ئاماژه‌ بۆ به‌ڵگه‌ و حوججیه‌تی پێغه‌مبه‌رایه‌تیی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌كات، كه‌ هێنده‌ ڕاست و ڕه‌وایه‌ گه‌یشتووه‌ته‌ پله‌ی ته‌عزیم و شكۆمه‌ندی، بۆیه‌ سوێندی پێ ده‌خورێت!

قورئانی پیرۆز به‌م ئاماژه‌یه‌ ده‌فه‌رموێ: تۆ پێغه‌مبه‌ری ڕه‌وانه‌كراوی خوای گه‌وره‌یت، چونكه‌ قورئانێكی حه‌كیمت له‌ده‌ستدایه‌، خۆ قورئان خۆیشی حه‌قه‌ و گوفتاری حه‌قه‌، چونكه‌ حیكمه‌تی ڕاسته‌قینه‌ و حه‌قی تێدایه‌ و مۆری ئیعجازی له‌سه‌ر دراوه‌.

هه‌روه‌ها بۆ نموونه‌كانی مه‌قامی "ئیسبات" كه‌ دارای ئیعجاز و ئیجازن، ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌ باس ده‌كه‌ین:

﴿قالَ مَنْ يُحْيِ الْعِظامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ۞ قُلْ يُحْيِيها الَّذي أَنْشَأها أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ (يس:٧٨-٧٩).

له‌ "نموونه‌ی سێهه‌می ڕاستیی نۆهه‌می وته‌ی ده‌هه‌م"دا وێنه‌یه‌كی ناسك بۆ ئه‌م مه‌سه‌له‌یه‌ به‌م شێوه‌یه‌ی خواره‌وه‌ كێشراوه‌:

پێشه‌وایه‌كی مه‌زن ده‌توانێت له‌ به‌رچاوی خۆماندا سوپایه‌كی گه‌وره‌ له‌ ماوه‌ی یه‌ك ڕۆژدا پێكبهێنێت. جا ئه‌گه‌ر یه‌كێك پێت بڵێت: (ئه‌م پێشه‌وایه‌ ته‌نها به‌ فووپیاكردنێكی شه‌یپووری سه‌ربازی ده‌توانێت یه‌ك به‌ یه‌كی ئه‌و تابووره‌ سوپایه‌ كۆ بكاته‌وه‌ كه‌ بۆ حه‌وانه‌وه‌ بڵاو بوونه‌ته‌وه‌ و، یه‌كسه‌ری و به‌ ڕێكوپێكی له‌ شوێنی خۆیاندا ئاماده‌یان بكات) گه‌ر تۆش له‌ وه‌ڵامدا پێت وت: (نه‌خێر... باوه‌ڕ ناكه‌م) ئایا ئینكاری و ملنه‌دانه‌كه‌ت چه‌نده‌ له‌ ژیرییه‌وه‌ دوور ده‌بێت!

به‌ هه‌مان جۆر خوای گه‌وره‌ش - ولله المثل الأعلى - كه‌ جه‌سته‌ی سه‌رجه‌می "زینده‌وه‌ران" له‌ نه‌بوونه‌وه‌ و، وه‌ك سه‌ربازه‌كانی سوپایه‌كی گه‌وره‌ و، به‌ كه‌ماڵی ڕێكوپێكی و كه‌ماڵی حیكمه‌ت به‌دی ده‌هێنێت و، گه‌ردیله‌كان و لایه‌نه‌ ناسكه‌كانی جه‌سته‌ی یه‌ك به‌ یه‌كیشیان به‌ فه‌رمانی "كن فيكون" له‌ هه‌موو سه‌ده‌ و به‌هارێك و له‌ ڕووی سه‌رانسه‌ری زه‌ویدا كۆ ده‌كاته‌وه‌ و ده‌یانپارێزێت و.. سه‌دان هه‌زار جۆری زینده‌وه‌رانی تری وه‌ك ئه‌مانه‌ به‌دی ده‌هێنێت.. ئایا ئه‌و خاوه‌ن توانسته‌ زانایه‌ی كه‌ هه‌موو ئه‌م كارانه‌ ئه‌نجام ده‌دات، كۆكردنه‌وه‌ی گه‌ردیله‌ بنه‌ڕه‌تی و به‌شه‌ ئه‌صڵییه‌ یه‌كترناسه‌كانی له‌ ژێر ڕێسای جه‌سته‌دا و به‌ وێنه‌ی سه‌ربازه‌كانی سوپایه‌كی ڕێكوپێك و به‌ لێدانێكی شه‌یپووره‌كه‌ی حه‌زره‌تی ئیسرافیل، به‌لاوه‌ گران ده‌بێت؟ بێ گومان به‌دوور زانینی ئه‌م كاره‌ له‌و زانا خاوه‌ن توانسته‌وه‌، جگه‌ له‌ شێتی هیچی تر نییه‌!

سەبارەت بە مەقامی "رێنمایی"ش، ئەوا "بەیان" و ڕوونکردنەوەکانی قورئان هێندە بەتین و بەرز و هاوڕاز و ناسکن کە "گیان" لە شەوق و "ژیری" لە تاسەو، "چاو"یش لە فرمێسك پڕ دەکەن! با لە نێوان هەزاران نموونەیدا ئەمەی خوارەوە بهێنینەوە:

﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُمْ مِنْ بَعْدِ ذلِكَ فَهِيَ كَالْحِجارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ الْحِجارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْهارُ وَإِنَّ مِنْها لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْماءُ وَإِنَّ مِنْها لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ وَما اللهُ بِغافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (البقرة:٧٤).

هەروەك لە باسی "ئایەتی سێ‌هەمی مەقامی یەکەمی وتەی بیستەم"دا ڕوونمان کردەوە، ئەم ئایەتە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل دەدوێت و پێیان دەفەرموێت:

ئەی نەوەی ئیسرائیل! ئێوە بە چ دەردێکەوە گرفتار بوون وا گوێ بەو هەموو موعجیزانەی مووسا - درووودی لەسەر بێت - نادەن؟ ئەوەتا چاوەکانتان زەق و وشك بوون و فرمێسکیان لێ نایەت، دڵانیشتان هێندە ڕەق بووە کە شەوق و تین و گەرموگوڕییان لێ براوە، لە کاتێکدا کە بەردە ڕەق و تەقەکان بە تەنها یەك موعجیزەی مووسا - کە عەساکەیەتی - لە دوازدە سەرچاوەی جیاجیاوە فرمێسکی بەخوڕیان هەڵڕشت!

لێرەدا بەم ئەندازەیە واز دەهێنین و، پاشماوەی ئەم باسە بەو وتەیە دەسپێرین، کە بەپێی پێویست ئەم واتا ئیرشادییەی ڕوون کردووەتەوە.

لە مەقامی: "بۆڕدان و دەمکوتکردن"یشدا، تەنها بیر لەم دوو نموونەیەی نێوان هەزاران نموونەی ئەم مەقامە بکەرەوە:

★ نموونەی یەکەم:

﴿وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنا عَلى عَبْدِنا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَداءَكُمْ مِنْ دُونِ اللهِ إِنْ كُنْتُمْ صادِقِينَ﴾ (البقرة:٢٣).

واتە: گەر ئێوە دوودڵی و گومانتان سەبارەت بەم قورئانە لە دڵدایە کە بۆ بەندەکەی خۆمان نازڵمان کردووە، ئەوا - گەر ڕاست دەکەن و پێتان وایە گوفتاری مرۆڤە - بە هەمووتان تەنها یەك سوورەتی وەك قورئان بهێنن و، با لەمەشدا یارمەتیدەر و لایەنگرانتان پشتتان بگرن و یارمەتیتان بدەن.

لێرەدا تەنها ئاماژەیەکی پوخت بۆ ئەمە دەکەین، چونکە لە "إشارات الإعجاز"دا ڕوونمان کردووەتەوە و چەسپاندوومانە. پوختە ئاماژەکەش بەم جۆرەیە:

قورئانی خاوەن ئیعجازی "بەیان" دەفەرموێ: ئەی کۆمەڵی جینئی و ئادەمیزاد! ئەگەر گومانتان وایە کە قورئان گوفتاری خواوەند نییە و پێتان وایە هی ئادەمیزادە، ئەوا مەیدانی "تەحەددی"تان لە بەردەمدایە، دەسا ئێوەش قورئانێکی وێنەی ئەمە لە لایەن کەسێکی

نه‌خوێنده‌وارى وه‌ك ئه‌و "محه‌ممه‌د"ه‌وه‌ بهێنن كه‌ خۆتان ناوى "الأمين"تان لىَ ناوه‌..

گه‌ر ئه‌مه‌تان نه‌توانى، ده‌با لاى كه‌سێكى "ڕه‌وانگۆ" يان لاى "زانايه‌ك" بيهێنن نه‌ك نه‌خوێنده‌وارێك..

خۆ ئه‌گه‌ر له‌مه‌شدا ده‌سته‌وسانن، ئه‌وا نه‌ك ته‌نها يه‌كێكتان، به‌ڵكو هه‌موو مرۆڤه‌ ڕه‌وانبێژه‌كانتان و وتارخوێنه‌ به‌تواناكانتان و ئاسه‌واره‌ باشه‌كانى پێشينانى ئه‌وان و يارمه‌تى و هاوكاريى كه‌سانى دواى خۆشيان و هيممه‌ت و لێبڕانى ئه‌وانه‌ش كه‌، جگه‌ له‌ خوا، هاوبه‌ش و يارمه‌تى‌ده‌رتانن، كۆ بكه‌نه‌وه‌ و چيتان له‌تواناد هه‌يه‌ به‌كارى بهێنن، هه‌تا شتێكى هاووێنه‌ى قورئان بهێنن..

گه‌ر ئه‌مه‌ش ناكه‌ن، ئه‌وا كتێبێك بهێنن كه‌ له‌ ڕه‌وانبێژى و هۆنينى‌دا وه‌ك قورئان وابێت، با له‌ ڕووى ڕاستى‌يه‌ مه‌زنه‌كان و موعجيزه‌ مه‌عنه‌وى‌يه‌كانى قورئانيشه‌وه‌، له‌ قورئان نه‌چێت!

ته‌نانه‌ت قورئان به‌ ئه‌ندازه‌يه‌كى له‌مه‌ش كه‌متر ته‌حه‌دداى كردن، ئه‌وه‌تا ده‌فه‌رموێ:

﴿فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ﴾ (هود:١٣).

واته‌: پێويست ناكات ئه‌وه‌ى ده‌يهێنن واتاكانى ڕاست بێت، ده‌با درۆ و ده‌مهه‌ڵبه‌ست بێت، به‌ مه‌رجێ له‌ قورئان بچێت..

گه‌ر ئه‌مه‌شتان نه‌توانى، با به‌ ئه‌ندازه‌ى هه‌موو قورئان نه‌بێت، به‌ڵكو به‌ ئه‌ندازه‌ى "ده‌" سووره‌تى وه‌ك سووره‌ته‌كانى قورئان بێت..

گه‌ر ئه‌مه‌شتان نه‌توانى ئه‌وا ته‌نها يه‌ك سووره‌تى وه‌ك قورئان بهێنن، خۆ گه‌ر ئه‌مه‌شتان به‌لاوه‌ گرانه‌، ده‌با وه‌ك سووره‌تێكى كورتى قورئان وابێت..

له‌ كۆتايى‌دا پێيان ده‌فه‌رموێ: مادام له‌مه‌شدا ده‌سته‌وسانن، ئه‌وا دياره‌ پێتان ئه‌نجام نادرێت (كه‌ هه‌ر ناشتوانن ئه‌نجامى بده‌ن) هه‌رچه‌نده‌ش گه‌لێ پێويستتان به‌وه‌ هه‌يه‌ شتێكى وه‌ك قورئان بهێنن، چونكه‌ شه‌ره‌ف و عيززه‌ت و ئايين و ده‌مارگيرى و سامان و گيان و ئه‌م دنيا و ئه‌ودنياشتان ته‌نها به‌وه‌ پارێزراو ده‌بێت كه‌ شتێك بهێنن له‌ قورئان بچێت، ده‌نا هه‌ر له‌ دنيادا شه‌ره‌ف و ئايينتان ده‌كه‌وێته‌ مه‌ترسى‌يه‌وه‌ و خۆشتان گرفتارى زه‌ليلى ده‌بن و ماڵ و سامانيشتان له‌ده‌ست ده‌رده‌چێت، له‌ دواڕۆژيشدا خۆتان و بته‌كانتان ده‌بنه‌ سووته‌مه‌نيى دۆزه‌خ و، حوكمى به‌ندبوونى ئه‌به‌ديتان له‌سه‌ر ده‌رده‌كرێت:

﴿فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ (البقرة:٢٤).

جا مادام ئێوه‌ به‌ "هه‌شت" پله‌ ده‌سته‌وسانيى خۆتان بۆ ده‌ركه‌وت، ئه‌وا ده‌بێ بزانن كه‌ قورئان به‌ "هه‌شت" پله‌ داراى ئيعجازه‌. جا يان ده‌بێ ئيمانى پێ بهێنن، ياخود به‌ يه‌كجاره‌كى بێ‌ده‌نگ بن و، له‌و دنياش با جێگه‌تان هه‌ر دۆزه‌خ بێت، كه‌ خراپترين جێ و ڕێ و ئه‌نجامه‌.

جا تۆش دوای ئەوەی کە ئەم بەیان و ئیلزامەی قورئانت لە مەقامی "دەمکوتکردن"دا زانی، بڵێ: زۆر ڕاستە، هیچ "بەیان"ێك نییە لە سەرووی بەیانی قورئانەوە بێت.

★ نموونەی دووهەم:

﴿فَذَكِّرْ فَما أَنْتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكاهِنٍ وَلا مَجْنُونٍ ۞ امْ يَقُولُونَ شاعِرٌ نَتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ ۞ قُلْ تَرَبَّصُوا فَإِنِّي مَعَكُمْ مِنَ الْمُتَرَبِّصِينَ ۞ أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلامُهُمْ بِهذا أَمْ هُمْ قَوْمٌ طاغُونَ ۞ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ بَلْ لا يُؤْمِنُونَ ۞ فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِثْلِهِ إِنْ كانُوا صادِقِينَ ۞ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخالِقُونَ ۞ أَمْ خَلَقُوا السَّموات والأَرْضَ بَلْ لا يُوقِنُونَ ۞ أَمْ عِنْدَهُمْ خَزائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ ۞ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُمْ بِسُلْطانٍ مُبِينٍ ۞ أَمْ لَهُ الْبَناتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ ۞ أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجراً فَهُمْ مِنْ مَغْرَمٍ مُثْقَلُونَ ۞ أَمْ عِنْدَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ۞ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْداً فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ ۞ أَمْ لَهُمْ إِلهٌ غَيْرُ اللهِ سُبْحانَ اللهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (الطور:٢٩-٤٣).

وا بەم جۆرەی خوارەوە لە نێوان ئەو هەزاران ڕاستییانەی کە لەم ئایەتانەدا هەن، تەنها یەك حەقیقەت بە نموونە دەهێنینەوە بۆ مەقامی "بۆڕدان و دەمکوتکردن":

ئەم کۆمەڵە ئایەتە پیرۆزە، هەموو دەستە و تاقمەکانی گومڕایان دەمکوت و بێدەنگ دەکات و، گشت گومانەکانیان لە ڕیشەوە دەردەهێنێت و دەرگایان لەسەر دادەخات. ئەمەش تەنها بە وشەی: "أم" کە یازدە چینی ئیستیفهامی ئینکاریی یەك لە دوای یەکی لەم ئایەتانەدا پێکهێناوە و، تەنانەت یەك دانەش لەو کەلێن و کەلەبەرانەی شەیتان ناهێڵێتەوە کە گومڕایان خۆیانی تێدا مەڵاس دەدەن، بەڵکو هەموویان دادەخات و، گشت ئەو پەردانەش دەدڕێنێت کە خۆیانی لە پشتەوە دەشارنەوە و، سەرجەمی ئەو درۆیانەشیان پووچەڵ دەکاتەوە کە لەسەر زاریاندا دووپاتی دەکەنەوە..

کەواتە هەموو بڕگەیەکی ئەم ئایەتانە، پوختەی ناوەڕۆك و چەمکی کوفرێك بەتاڵ دەکاتەوە کە یەکێك لە پێڕ و تاقمە کافرەکان برەوی پێ دەدەن. ئیتر ئەم کارەی ئایەتەکان چ بە تەعبیرێکی پوختی کورت بێت، یان بە لێ بێدەنگبوون و حەوالەکردنی بێت بۆ حوکمی "بەڵگەنەویستیی ژیری" لەبەر ئاشکرایی و ڕوونیی بەتاڵییەکەی، یان بە ئاماژەیەکی پوخت بێت بۆ ئەو چەمکە کوفرییانەی کە لە شوێنی تردا بە درێژی پووچەڵ کراونەتەوە. وەکو: بڕگەی یەکەم کە ئاماژە بۆ ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَمَا عَلَّمْناهُ الشِّعْرَ وَما يَنْبَغِي لَهُ﴾ دەکات و، بڕگەی یازدەهەمیش کە هێمایە بۆ ئایەتی پیرۆزی: ﴿لَوْ كانَ فِيهِما آلِهَةٌ إِلاَّ اللهُ لَفَسَدَتَا﴾.

دەتوانیت بۆ خۆت بڕگەکانی تر بەم جۆرەی خوارەوە بۆ سەر ئەم بڕگەیە قیاس بکەیت:

ئه‌وه‌تا ئـه‌م ئایه‌تانـه لـه پێشـه‌كی‌دا ده‌ڵێـن: ئـه‌ی پێغه‌مبـه‌ر ﷺ! بـۆ خـۆت ئه‌حكامـه‌كانی خواوه‌ند ڕابگه‌یه‌نه و، بزانه كه تۆ هه‌رگیز "كاهین" نییت، چونكه گوفتاری كـاهین: تێكـه‌ڵو پێكـه‌ڵ و ده‌ست هه‌ڵبه‌سته و لـه وه‌هـم و گومـان تێ‌ناپـه‌ڕێت، بـه‌ڵام گوفتـاری تـۆ: حـه‌قی ڕاسته‌قینه و یه‌قینی بێ گومانه.. هه‌روه‌ها ئه‌و ئه‌حكامانه‌ی خواوه‌ندیان یاد بخه‌ره‌وه و، دڵنیابه كه هـه‌رگیز تـۆ گرفتـاری "شـێتی" نـه‌بوویت، چونكـه ته‌نانـه‌ت دوژمنانیشـت شـایه‌تی له‌سـه‌ر كه‌ماڵی عه‌قڵـت ده‌ده‌ن!

﴿أَمْ يَقُولُونَ شاعِرٌ نَتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُـــونَ﴾؟ گه‌لـێ سـه‌یره! ئایا ئـه‌وان بـه وێنـه‌ی ئـه‌و عه‌وامانه‌ی كه "ژیری"یان ناكه‌ن به ده‌مڕاست و تفه‌نگ بـه تاریكی‌یـه‌وه ده‌نێـن، پێـت ده‌ڵێـن: "شاعیر"؟ یان ئایا چاوه‌ڕوانی مردن و نه‌مانی تۆن؟! ده تـۆش پێ‌یـان بڵـێ: "چـاوه‌ڕوان بـن، وا منیـش وه‌ك ئێـوه چـاوه‌ڕوانم". چونكـه ئـه‌و ڕاسـتی‌یه دره‌خشـان و مه‌زنانـه‌ی كـه تـۆ هێنـاوتن گه‌لـێ به‌رز و خاوێنه لـه خه‌یاڵ و ئه‌ندێشه‌ی شاعیر و، هه‌رگیز پێویسـتی بـه ئارایشـتی "شـیعر" نی‌یه.

﴿أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلامُهُمْ بِهذا﴾ یان ئایا ئه‌وان پێیـان عـاره شـوێن تـۆ بكـه‌ون و بـه وێنـه‌ی ئـه‌و فه‌یله‌سووفانه‌ن كه به "ژیریی به‌تاڵ"ی خۆیانه‌وه ده‌نـازن و ده‌ڵێـن: "ژیرێمـان سـه‌روزیاده"؟ لـه كاتێكدا كه خودی ژیری داخوازی ئه‌وه‌یه شـوێنت بكـه‌ون؟ چونكـه هـه‌ر گوفتـارێك كـه تـۆ ده‌یڵێیت به لای ژیری‌یه‌وه گوفتارێكی په‌سه‌نده، هه‌رچه‌نده‌ش بـه ته‌نـها خـۆی نـاتوانێت پـه‌ی پێ ببات و پێی بگات.

﴿أَمْ هُمْ قَوْمٌ طاغُونَ﴾ یان هۆی ئینكاری‌یان ملنه‌دانه بۆ "حه‌ق" به وێنه‌ی سته‌مكاران؟ لـه كاتێكدا كه پاشـه‌ڕۆژی فیرعـه‌ون و نـه‌مرووده سه‌رسـه‌خت و سته‌مكاره‌كان ئاشـكرایه و لـه كه‌س په‌نهان نی‌یه؟!

﴿أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ بَلْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ یان بـه‌وه تۆمـه‌تبارت ده‌كـه‌ن كـه قورئـان ده‌مهه‌ڵبه‌ستی تۆیه و لـه لایه‌ن خۆته‌وه هێناوته، وه‌ك وته‌ی ئه‌و موونافقه درۆزنانه‌ی كـه خـاوه‌نی ویـژدان نـین؟ له كاتێكدا كه ئه‌وانه هـه‌ر خۆیـان تـا ئێستاش له‌بـه‌ر ڕاستگۆیی گوفتاره‌كـانت پێـت ده‌ڵێـن: "محمد الأمین"؟ كه‌واته ئه‌وانه نیازی ئیمان هێنانیان له دڵدا نی‌یه، ده‌نا با بڕۆن له‌ناو گوفتـار و ئاسه‌واری مرۆڤدا شتێك بدۆزنه‌وه له قورئان بچێت.

﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ﴾ یان ئایا ئه‌وان خۆیان به سه‌ربه‌ست و به‌رباد داده‌نێـن و، پێ‌یـان وایه به هه‌ڕه‌مه‌كی و بێ ئامانج به‌دی‌هێنراون و، هیـچ كارمه‌ندی‌یه‌كیان لـه ئه‌ستۆدا نی‌یـه و، بێ خاوه‌ن و به‌دیهێنه‌ر هاتوونه‌ته ئه‌م دنیایه و، وه‌ك فه‌یله‌سووفه عه‌به‌سی‌یه‌كان له‌و باوه‌ڕه‌دان: گه‌ردوون سه‌رتاپا هه‌ڕه‌مه‌كی و بێ‌مه‌به‌ستی‌یه؟ ئایا چاویـان كوێـر بـووه كـه نـابینن گـه‌ردوون لـه‌م سـه‌ره‌وه بـۆ ئه‌وسـه‌ری بـه چـه‌نده‌ها حیكمـه‌ت ڕازاوه‌تـه‌وه و بـه‌ری چـه‌ندین مه‌به‌سـت و ئامـانجی گرتـووه و سه‌رانسـه‌ری بوونـه‌وه‌رانیش، هــه‌ر لــه گه‌ردیله‌كانــه‌وه تــا ده‌گاتــه

گەلەستێرەکان، چەندین کارمەندی و ئەرکی مەزنیان لە ئەستۆ نراوە و ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواوەندن؟

﴿أَمْ هُمُ الْخالِقُونَ﴾ یان بە وێنەی ماددی‌یە فیرعەون ئاساکان لەو گومانەدان کە شتان بۆ خۆیان پێکدێن و لە خۆیانەوە گەشە دەکەن و بۆ خۆشیان پێداویستی‌یەکانیان بەدی دەهێنن، تا وایان لێ هاتووە سڵ لە ئیمان دەکەنەوە و ملی بەندایەتی بۆ خوای گەورە نەوی ناکەن؟ کەواتە ئەوان - بەپێی ئەو گومانە - خۆیان بە خالیق(بەدیهێنەر) دادەنێن! لە کاتێکدا کە بەدیهێنەری هەر شتێك دەبێ بەدیهێنەری هەموو شتان بێت! دیارە لەخۆبایی‌بوون و سەرسەختی و ملنەدانیان، گرفتاری ئەوپەڕی نەفامی و نەزانیی کردوون و لەو گومانەدان کە: ئەو کەسەی لە بەردەم لاوازترین بەدیهاتووی وەك مێش و میکرۆبدا دەستەوسانە، خاوەنی توانستێکی ڕەها بێت! جا مادەم ئەوان تا ئەم ڕادەیە دەستیان لە ژێری داشۆردووە و لە مرۆڤایەتی داماڵراون، ئەوا لە ئاژەڵیش زیاتر سەریان لێ شێواوە، تەنانەت پلەی ئەوان لە ئاستی بێ گیانەکانیش گەلێ نزمترە. کەواتە گوێ بە ئینکاری و سەرسەختیی ئەوانە مەدە و، لە ڕیزی ئاژەڵە زیانبەخش و تەنانەت ماددە و کەرەسە گەنیوەکاندا دایان بنێ و، پشتگوێیان بخە و هەر ئاوڕیشیان لێ مەدەرەوە!

﴿أَمْ خَلَقُوا السَّمواتِ والأَرْضَ بَلْ لا يُوقِنُونَ﴾ یان بە وێنەی تاقمی نەفامی "موعەتیلە"(المعطلة) کە ئینکاریی بوونی بەدیهێنەریان دەکرد، ئەمانیش ئینکاریی بوونی دەکەن و گوێ بۆ قورئان ڕاناگرن؟! کەواتە یان دەبێ ئینکاریی بەدیهاتنی ئاسمانەکان و زەوی بکەن.. یان دەبێ بڵێن: خۆمان بەدیمان هێناون و، بەم پێیە خۆیان بە تەواوەتی لە ژێری داماڵن و دەست بە وڕێنەی شێتانەوە بگرن! چونکە بەڵگەکانی "تەوحید" لە هەموو شوێنێکی گەردووندا بە ڕوونی دەخوێنرێنەوە و، هێندە زۆرن کە بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان و گوڵانی سەر ڕووی زەوی دەبن و، هەر هەموویان بە ئاشکرا بەڵگەن لەسەر بوونی بەدیهێنەری مەزن. کەواتە نایانەوێت مل بۆ حەق و یەقین کەچ بکەن، دەنا چۆن لەو گومانەدا دەبن کە: ئەم کتێبە مەزنەی گەردوون کتێبێکی بێ "نووسەر" بێت، کە کتێبێکە هەموو پیتێکی هەزاران کتێبی تێدا نووسراوە؟ لە کاتێکدا کە زۆر بە باشی دەزانن هیچ پیتێکی نووسراو نی‌یە "نووسەر"ی نەبێت؟!

﴿أَمْ عِنْدَهُمْ خَزائِنُ رَبِّكَ﴾ یان ئەوان بە وێنەی هەندێ "فەیلەسووفی گومڕا" نەفیی "ئیرادەی خوا" دەکەن و، وەك "بەرهەمی"یەکانیش ئینکاریی خودی "پێغەمبەرایەتی" دەکەن، وا ئیمانت پێ ناهێنن؟!

کەواتە یان دەبێ: ئینکاریی هەموو ئاسەوارەکانی حیکمەت و، ئامانجە مەزنەکان و، ڕێکوپێکی‌یە ناوازە و، سوودە بەرهەم بەخشەکان و، ئاسەوارەکانی میهرەبانیی فراوان و بایەخ و چاودێریی لە ڕادەبەدەر بکەن، کە بە ئاشکرا بەسەر ڕووی سەرجەمی بوونەوەرانەوە

دەبینرێن و بەڵگەن لەسەر "ویستی خوای گەورە".. هەروەها ئینكاریی سەرجەم موعجیزاتی پێغەمبەرانیش بكەن، درووديان لەسەر بێت.. یان دەبێ بڵێن: گەنجینەی ئەو چاكەكاریيانەی كە بەسەر گشت بوونەوەراندا دەبارێت، لای ئێمەیە و بە دەست خۆمانەو، ئیتر بەمە ڕووی ڕاستەقینەیان دەربخەن و، لای خەڵكی ئاشكرا ببێت كە شایانی تەنانەت گفتوگۆ لەگەڵ كردنیش نین! كەواتە خەم بە ئینكاریی ئەوانە مەخۆ، چونكە خواوەند گەلێ ئاژەڵی سەر لێ شێواوی زۆری هەیە!

﴿أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ﴾ یان لەو وەهمەدان كە ئەوان چاودێر بن بەسەر كردارەكانی خواوەندەوە؟ ئایا دەیانەوێت خوای گەورە بكەن بە بەرپرسیاری كارەكانی، بە وێنەی بۆچوونی تاقمی موعتەزیلە كە "ژیری"ی مرۆڤیان كردبوو بە فەرمانڕەوا و دەمڕاست؟! كەواتە بایەخیان پێ مەدە، چونكە ئینكاریی ئەو لەخۆباییيانە و كەسانی هاوچەشنیان هیچ ئەنجامێكی لێ ناوەشێتەوە!

﴿أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُمْ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾ یان ئەوان لەو گومانەدان كە ڕێیەكی تریان بۆ "جیهانی غەیب" دۆزیوەتەوە، وەك لاف و گەزافی ئەو كاهینانەی كە شوێن جینەی و شەیتان كەوتوون و، بە وێنەی درۆ و دەلەسەی جادووگەرانی "تحضير الأرواح"؟ یان ئایا لەو گومانەدان پلیكانەیەكیان لایە بۆ ئەو ئاسمانەی كە دەرگاكانی لە ڕووی شەیتانەكاندا داخراوە، هەتا باوەڕ بەو هەواڵەی ئاسمان نەكەن كە تۆ وەری دەگریت و ڕایدەگەیەنیت؟ كەواتە ئینكاریی ئەو لەڕێلادەر و درۆزنانە و هاوچەشنیان، لە حوكمی "عەدەم"دایە!

﴿أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ﴾ یان ئەوان بە ناوی "دە ژیرییەكان"(العقول العشرة) و "خاوەنی جۆرەكان" هاوبەش بۆ خواوەندی تەنیای صەمەد دادەنێن، وەك ئەوەی كە هەندێ فەیلەسووفی موشریك لەو باوەڕەدان؟ یان جۆرە خوایەتییەك دەدەنە پاڵ مەلائیكەت و ئەستێرەكان، بە وێنەی "صابیئییەكان"؟ یان بە وێنەی مولحیدان و گومڕایان "منداڵ"ی دەدەنە پاڵ، كە ئەمەش پێچەوانەی "پێویستی بوون"ی خواوەندی گەورە و "یەكتایی" و "صەمەدانییەت"ی ئەوە، كە خوایەكە لەوپەڕی مەزنیدایە و پێویستی بە هیچ شتێك نییە؟ یان مەلائیكەتان بە مێینە لە قەڵەم دەدەن كە ئەمەش پێچەوانەی بەندایەتی و عیصمەت و سروشتیانە؟ ئایا پێیان وایە بەم گومانەیان چەند تكاكارێكیان بۆ خۆیان پەیدا كردووە تا شوێنت نەكەون؟! خۆ مرۆڤ تەنها لەبەر "فانی بوون"یەتی كە وا بە دوای میراتگری جێگەداردا دەگەڕێت و، تا ڕادەی شەیدابوونیش دنیای خۆش دەوێت و، دەستەوسانە و، پێویستی بە مانەوەی هاوڕەگەزەكەی هەیە و، وەچەكەوتنەوە(التناسل) و زۆربوون و دابەشبوونی جیسمانیی لە باردایە، ئەو وەچەكەوتنەوەیەی كە هۆكاری مانەوە و پەیوەندیدەری ژیانی سەرجەمی بوونەوەرانە.. جا نیسبەتدانی ئەم وەچەكەوتنەوەیەی كە

سیفەتی بوونەوەرە فانی‌یەکانە، لە کەسێك کە "واجب الوجود" و، باقی و، هەمیشەیی و، ئەزەلی و، ئەبەدی و، زاتی و، خاوێن لە جیسمانییەت و دابەشبوونی ماهییەتە و دەستی کۆڵەواری هەرگیز بە داوێنی توانستی ناگات و، تاك و تەنیا و مەزن و شکۆمەندە.. هەروەها نیسبەتدانی "منداڵ" بۆ لای ئەو، بە تایبەت لاوازە دەستەوسانەکانی وەك "کچان" کە غرووری ئەوانە بۆ خۆیان پێی قایل نابێت..

دیارە هەموو ئەمانە، چەنەبازی و شێتی و وڕێنەیەکی وەهان کە پێویست بە وەڵامدانەوە و پووچەڵکردنەوە و دەرخستنی بەتاڵی‌یان ناکات! دەسا تۆش گوێیان لێ ڕامەگرە و بایەخیان پێ مەدە، چونکە گوێ بۆ چەنەبازیی هەموو مەستێك و وڕێنەی هەموو شێتێك ڕاناگیرێت!

﴿أَمْ تَسْأَلُهُمْ أجراً فَهُمْ مِنْ مَغْرَمٍ مُثْقَلُونَ﴾ یان ئەرکەکانی ئەو "بەندایەتی"یەیان بەلاوە قورسە کە تۆ داوایان لێ دەکەیت؟ بە وێنەی ئەو ستەمکارانەی کە بە هەڵپەوە دەستیان لە دنیا گیر کردووە و، لەسەر نزمایەتی ڕاهاتوون و لە هەڵگرتنی ئەرکەکان هەڵدێن؟!

ئایا نازانن کە تۆ نە لەوان و نە لە هیچ کەسێك - جگە لە خوای گەورە - داوای پاداشت ناکەیت؟

ئایا پێیان گرانە صەدەقە و خێر لەو ماڵ و سامانە بدەن کە خوای گەورە پێی بەخشیون بۆ ئەوەی بەرەکەت بکەوێتە ئەو ماڵەوە و پەرە بسێنێت و لە حەسوودیی هەژاران بپارێزرێت و دوعای خراپیش لە خاوەنەکەی نەکرێت؟ خۆ ئەندازەی زەکات "یەك لە دە" یان لە "یەك لە چل"ە و بە هەژارەکانی خۆیان دەدرێت، ئایا ئەم کارەیان هێندە بەلاوە قورس و گرانە تا لە ئایینی ئیسلام هەڵبێن؟

کەواتە ئەوان شایانی تەنانەت ئەوەش نین وەڵامی بەدرۆخستنەوەکەیان بدرێتەوە، چونکە ئەو وەڵامە تابڵێی ڕوونە و تابیشڵێی ئاسانە، بەڵکو ئەوان شایانی تەمێ کردنن نەك وەڵامدانەوە!

﴿أَمْ عِنْدَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ﴾ یان ئەوان حەزیان لەو هەواڵە غەیبی‌یانە نی‌یە کە بە دەستی تۆ دەگەن و، دەچن بە وێنەی "بووزی‌یەکان" لافی غەیبزانی لێ دەدەن و، وەك "عەقلانی‌یەکان"یش گومانەکانیان بە "یەقین" دەزانن؟!

یان کتێبێکی کراوەی غەیبیان لە لایە و لەبەری دەنووسنەوە تاکو بەرپەرچی کتێبە غەیبی‌یەکەی تۆی پێ بدەنەوە؟! خۆ پەردەی ئەو جیهانە تەنها لە ڕووی پێغەمبەرانی وەحی بۆهاتوودا لا دەدرێت و، کەس ناتوانێت بۆ خۆی سەری پێدا بکات!

کەواتە هەرگیزاو هەرگیز بەدرۆخستنەوەی ئەم لەخۆبایی و خۆبەگەورەزانانەی کە سنووری خۆیان شکاندووە، لە بانگەوازەکەت ساردت نەکاتەوە و پشتێنت پێ شل نەکات،

چونكه به‌م نزيكانه ئه‌و ڕاستی‌یانه‌ی كه تۆ هێناوتن هه‌موو خه‌یاڵه‌كانی ئه‌وان وردوخاش ده‌كات و ئه‌ندێشه‌یان به با ده‌دات و ئاسه‌واری ناهێڵێت!

﴿أَمْ يُرِيدُونَ كَيْداً فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ﴾ یان ده‌یانه‌وێت وه‌ك ئه‌و مونافقانه و ابن كه سروشتیان تێكچووه و ویژدانیشیان گه‌نیوه.. یان ڕێی ڕاستی هیدایه‌ت له خه‌ڵكی بگرن به وێنه‌ی ئه‌و زه‌ندیقه فێڵبازانه‌ی كه به فروفێڵ به‌ربه‌ستی ئه‌و هیدایه‌ته ده‌كه‌ن كه خۆیان لێی بێ به‌شن؟ به ڕاده‌یه‌ك كه ناوی "كاهین" و "شێت" و "ساحیر"یان له تۆ ناوه، له كاتێكدا كه نه‌ك خه‌ڵكی به‌ڵكو خۆشیان باوه‌ڕ به ده‌عواكه‌یان ناكه‌ن؟ ده‌سا تۆش بایه‌خ به‌و درۆزن و فێڵبازانه مه‌ده و، له ڕیزی مرۆڤدا دایان مه‌نێ! به‌ڵكو هه‌ر بۆ خۆت له بانگه‌وازی خه‌ڵكی‌دا بۆ لای خوای گه‌وره به‌رده‌وام به و، هیچ شتێك له‌م كاره‌ت ساردت نه‌كاته‌وه. خۆ ئه‌وانه فێڵ له تۆ ناكه‌ن، به‌ڵكو له خۆیانی ده‌كه‌ن و زیانه‌كه‌ی به خۆیان ده‌گه‌یه‌نن. سه‌ركه‌وتنیشیان له كاروباری فێڵ و فه‌سادا شتێكی كاتی و كه‌م خایه‌نه، ته‌نانه‌ت ته‌ڵه و داوێكه خوا بۆی ناونه‌ته‌وه!

﴿أَمْ لَهُمْ إِلَهٌ غَيْرُ اللهِ سُبْحَانَ اللهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ یان ئه‌وان بۆ ئه‌وه له دژت ڕاده‌وه‌ستن و پێویستیان پێت نی‌یه چونكه گومانیان وایه: جگه له خوای گه‌وره خوایه‌كی تریان هه‌یه و پشتی پێ ده‌به‌ستن؟ وه‌كو "مه‌جووسه‌كان" كه گومانیان وابوو دوو خوا هه‌یه: یه‌كێكیان به ناوی به‌دیهێنه‌ری خێر و ئه‌وی تریشیان به ناوی به‌دیهێنه‌ری شه‌ڕ؟ یان به وێنه‌ی "هۆكارپه‌رست" و "بت په‌رستان" كه جۆره خوایه‌تی‌یه‌ك به هۆكاره‌كان ده‌به‌خشن و به مایه‌ی پشت پێ‌به‌ستنی داده‌نێن؟

كه‌واته ئه‌وانه چاویان به ته‌واوی كوێر بووه، چونكه ئایا ئه‌م ڕێكوپێكی‌یه هه‌ره كامڵ و له‌گه‌ڵیه‌ك گونجانه هه‌ره جوانه‌ی ئه‌م گه‌ردوونه مه‌زنه نابینن كه وه‌ك ڕۆژ نمایانه؟!

خۆ به‌پێی داخوازیی ئایه‌تی: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللهُ لَفَسَدَتَا﴾ گه‌ر دوو كوێخا له گوندێكدا و، دوو پارێزگار له پارێزگایه‌كدا و، دوو پادشا له وڵاتێكدا هه‌بێت، ئه‌وا به حه‌تمی ڕێسا و ڕێكوپێكیی ئه‌و شوێنه تێك ده‌چێت و پێكه‌وه‌گونجان(انسجام)یش به ته‌واوی له گۆڕێ‌دا نامێنێت. كه‌چی ڕێكوپێكیی تابڵێی ورد له‌م گه‌ردوونه‌دا هه‌ر له باڵی مێشووله‌وه تا ئه‌ستێره‌كانی ئاسمان ئاشكرا و له‌به‌رچاوه.

كه‌واته ته‌نانه‌ت به ئه‌ندازه‌ی باڵی مێشووله‌یه‌كیش جێی هاوبه‌ش له‌م گه‌ردوونه‌دا نابێته‌وه. جا مادام ئه‌وانه له چوارچێوه‌ی "ژیری" ده‌رده‌چن و له دانایی و مه‌نتیق هه‌ڵدێن و به ته‌واوی پێچه‌وانه‌ی هه‌ست و شعوور ڕه‌فتار ده‌كه‌ن، ئه‌وا به‌درۆخستنه‌وه‌ی ئه‌وانه ڕێگای ڕێنمایی و یادخستنه‌وه‌ی خه‌ڵكیت لێ نه‌گرێت!

* * *

بەم جۆرە و بە کورتی، تەنها یەك گەوهەری نێوان سەدانی ئەم ئایەتەمان ڕوون کردەوە کە زنجیرەی ڕاستییەکانن و، گەوهەرێکی تایبەت بوو بە مەقامی "بۆردان و دەمکوتکردن"ەوە. خۆ ئەگەر بمتوانییایە چەند گەوهەرێکی ترم لێ دەربهێنانایە، ئەوا بۆ خۆت دەت وت: هەر ئەم ئایەتانە بە تەنها خۆیان موعجیزەیەکی سەربەخۆ و سەروزیادن!

"بەیان"ی قورئان لە مەقامی "تێگەیاندن و فێرکردن"یشدا هێندە دەراسا و ناسك و ڕەوانە کە تەنانەت عەوامترین کەسی ئاساییش بەوپەڕی سووك و ئاسانی لە مەزنترین و قووڵترین ڕاستییەکان تێدەگەیەنێت.

بەڵێ، قورئانی پیرۆز بە شێوازێکی ئاسانی ڕوون و "بەیان"ێکی تێر و تەسەل، کە چاودێریی بیری عەوام دەکات و هەست و بیریان ئازار نادات و بێزار و ماندوویان ناکات، خەڵکی لە گەلێ ڕاستیی ئەوتۆ تێدەگەیەنێت کە بە ڕواڵەت قورس و تەماوی دیارن. چونکە هەروەك کەسێك کە لەگەڵ منالێکدا بدوێت، گوفتار و دەستەواژەی تایبەتیی بۆ بەکار دەهێنێت، شێوازەکانی قورئانیش کە پێیان دەوترێ: "التنـــزلات الإلهية الى عقــــول البشـــر" بە هەمان جۆرن، چونکە گوفتارێکن دادەبەزنە ئاستی پەی بردن و تێگەیشتنی ئەوانەی لەگەڵیاندا دەدوێت، بە ڕادەیەك کە عەوامترین نەخوێندەوارێش بەهۆی "تەشبیهـ و نموونە هێنانەوە" لە چەندەها ڕاستیی تەماوی و ڕاز و نهێنیی پەروەردگاریی ئەوتۆ تێدەگەیەنێت کە چەندین دانای بلیمەت و هەڵکەوتوو نەتوانن بە "بیر"ی خۆیان لێی تێبگەن و پەیی پێ ببەن!

بۆ نموونە ئایەتی پیرۆزی: ﴿الرَّحْمنُ عَلىَ الْعَرْشِ اسْتَوى﴾ پەروەردگارێتیی خواوەند و چۆنێتیی سازاندنی کاروبارەکانی جیهان لە لایەن ئەو پەروەردگارێتییەوە، بە شێوەی تەمسیل و شوبهاندنی بە پادشایەك ڕوون دەکاتەوە کە لەسەر عەرشەکەیەوە کاروباری پادشایەتیی خۆی بەڕێوە ببات.

بەڵێ، مادەم قورئان گوفتاری پەروەردگاری سەرجەمی جیهانەکانە، ئەوا:

لە پلەی هەرە مەزنی پەروەردگارێتییە شکۆمەندەکەیەوە نازڵ بووە و.. بەسەر پلەکانی تردا زاڵە و.. کەسانی باڵغی پێگەیشتوو بەرەو ئەو پلانە ڕێنمایی دەکات و.. حەفتا هەزار پەردەی بڕیوە و ئاوڕی لە هەموویان داوەتەوە و ڕووناکی کردوونەتەوە و.. نووری خۆی بەسەر هەزاران چین گوێبیستی جیاواز لە توانای پەی بردن و تێگەیشتندا بڵاو کردووەتەوە و.. ڕێژنەکانی خۆیشی بە درێژایی چەندین چەرخ و سەدەی ئەوتۆ پەخشاندووە کە توانا و لێهاتنی خەڵکی هەریەك لەو چەرخ و سەدانە لە هی ئەوانی تر گەلێ جیاواز بووە.. ئنجا هەرچەندەش واتاکانی خۆی بەوپەڕی ئاسانی بە هەموو شوێن و کاتێکدا بڵاو کردووەتەوە، کەچی هێشتا هەر حەیەوییەت و تەڕی و گەشیی خۆی لەدەست نەداوە و

لەوپەڕی ناسکی و تازەیی و پاراویدا و بە شێوەی: "سەهلی مومتەنیع" ماوەتەوە! چونکە هەروەك بەوپەڕی ئاسانی وانەکانی خۆی بە هەر عەوامێك دەڵێتەوە، بە هەمان ئاسانی بە گەلێ چینی زۆر و زەبەندی زیرەکی و تێگەیشتنە جیاجیا و جۆراوجۆرەکانیشی دەڵێتەوە و بۆ ڕاستەڕێی ئیمان ڕێنماییان دەکات و قەناعەت و دڵنیاییان پێ دەبەخشێت.

خۆ گەر بە هەر لایەکی ئەم کتێبە پیرۆزەدا چاو بگێڕیت، دەتوانیت بریسکانەوەیەکی "ئیعجاز" ببینیت.

**پوختەی ئەم قسانە:**

هەروەك زایەڵەی خوێندنی هەر "وشە"یەکی قورئان بۆ نموونە: خوێندنی وشەی: ﴿**أَلْحَمْدُ لِلّٰهِ**﴾ ئەو ئەشکەوتانە لە دەنگ پڕ دەکات کە دەڵێی گوێی چیاکانن و، لە هەمان کاتدا گوێی هەرە بچووکی مێشوولەیەکیش پڕ دەکات و هەمان وشەی تێدا جێگیر دەبێت.. "واتاکان"ی قورئانی پیرۆزیش بە هەمان جۆرن، چونکە هەروەك ژیرییە گەورەکان تێر دەکەن، هەر بەو جۆرە ژیرییە بچووك و تەواو سادەکانیش تێر دەکەن و، بە هەمان وشە دڵنیاییان پێ دەبەخشن!

چونکە قورئانی پیرۆز هەموو چینەکانی جینني و ئادەمیزاد بۆ باوەڕهێنان بانگ دەکات و زانستەکانی ئیمانیشیان بە فێرکردن و تێگەیاندنەوە بۆ دەچەسپێنێت. لەبەر ئەوە، تەمبەڵترین کەسی عەوامی نێوان خەڵکی لەگەڵ تایبەتترین کەسانی خەواصدا پێکەوە و شان بە شانی یەکتر گوێ بۆ دەرس و ڕێنماییەکانی قورئانی پیرۆز ڕادەگرن!

واتە قورئانی پیرۆز سفرەیەکی ئاسمانییە و، لە بەردەم هەزاران چینی بیر و ژیری و دڵ و گیاندا ڕاخراوە و، هەریەکەیان حەز و خواستەکانی خۆراکی خۆیانی تێدا بەدی دەکەن. تەنانەت گەلێ دەرگای قورئان هێشتا هەر بە داخراوی ماونەتەوە بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بکرێنەوە! گەر نموونەشت لەسەر ئەم مەقامە دەوێ، ئەوا قورئانی پیرۆز هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، نموونەی ئەم مەقامەیە.

بەڵێ، سەرجەم قوتابییانی قورئان و گشت ئەوانەی گوێیان بۆ ڕێنماییەکانی ڕاگرتووە، لە: موجتەهیدان و، صیددیقان و، دانایانی ئیسلام و، زانا لێکۆڵەرەکان و، زانایانی ئوصوولی فیقهـ و زانستی کەلام و، ئەولیایانی خواناس و، قوتبانی شەیدا و عاشق و، زانایانی وردەکار و، گشت موسڵمانان.. هەموویان بە یەکدەنگی دەڵێن:

(ئێمە ڕێنمایی خۆمان، بە جوانترین شێوە، لە قورئانی پیرۆز وەردەگرین)!

**بە پوختی:**

بە وێنەی مەقامەکانی پێشوو، ئیعجازی قورئان لەم مەقامی "تێگەیاندن و فێرکردن"ەشدا دەبریسکێتەوە.

# تیشکی دووهەم

## جامیعییەتی دەراسای قورئان(١)

### ئەم تیشکە پێنج بریسکانەوەی پەخش کردووە

□ بریسکانەوەی یەکەم:

**جامیعییەتی دەراسا لە "وشەکان"ی قورئاندا.**

ئەم جامیعییەتە لەو ئایەتانەی کە لە وتەکانی پێشوودا و لەم وتەیەشدا هێنراون، گەلێ ڕوون و ئاشکرایە.

بەڵێ، وشەکانی قورئان بە جۆرێکی وەهان کە هەموو گوفتارێکی، بەڵکو هەموو وشەیەکی، بگرە هەموو پیتێکی، تەنانەت هەندێ جار "سکون"ەکانیشی، گەلێ ڕووی زۆر و زەبەندەیان هەیە و، لە چەندین بابەتی جیاجیادا و لە گەنجینەی نەبڕاوەی خۆی بەشی هەموو ئەو کەسانە دەدات کە گوفتاریان ئاراستە دەکات، وەك فەرموودەی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردووە: "لِكُلِّ آيةٍ ظَهْرٌ وَبَطْنٌ وحَدٌّ وَمَطْلَعٌ"(٢) و "لِكُلٍّ شُجُونٌ وَغصونٌ وَفنون"(٣).

○ بۆ نموونە:

﴿وَالْجِبالَ أَوْتاداً﴾؟ (النبأ:٧).

واتە: ئایا چیاکانمان وەك مێخ بە زەویدا بۆ دانەکوتاون؟

بەشی مرۆڤی عەوام لەم گوفتارەدا ئەوەیە کە:

دەبینێت چیاکان – وەك لە بەرچاویدایە – بە وێنەی مێخ بە زەویدا داکوتراون. ئیتر بیر لە نیعمەت و سوودە زۆرەکانی چیاکان دەکاتەوە و، سوپاسی بەدیهێنەری دەکات.

بەشی شاعیرێکیش لەم گوفتارەدا ئەوەیە کە:

---

(١) مەبەست لە (جامیعییەت): کۆکردنەوەی گەلێ شتی زۆر و جیاجیایە لە یەك وشە یان یەك واتا یان یەك باس یان یەك شێوازدا . (وەرگێڕ)

(٢) (انزل القرآن على سبعة أحرف) رواه احمد والترمذي عن أُبي رضى الله عنه واحمد عن حذيفة، وهو عند الطبراني من حديث ابن مسعود بزيادة.. وفي رواية اخرى عنده: لكل حرف منها ظهر وبطن ولكل حرف حدّ ولكل حدّ مطّلع (باختصار عن كشف الخفاء ٢٠٩/١) واتە: هەموو "حەد"ێکی پلیکانەیەکی هەیە لە ڕێی زانینەوە مرۆڤ دەتوانێت بۆی سەربکەوێت، وەك لە "لسان العرب"دا هاتووە. (وەرگێڕ)

(٣) وفي المثل "الحديث ذو شجون" اي فنون واغراض، وقيل اي يدخل بعضه في بعض، أي: ذو شعَب وامتساك بعضه ببعض.. واصل الشجنة بالكسر والضم شعبة من غصن من غصون الشجرة (لسان العرب باختصار). (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبییەکەوە)

له ئه‌ندێشه‌ی خۆی‌دا زه‌وی وه‌ك ده‌شتایی‌یه‌كی تـه‌خت و، گومـه‌زی ئاسمـانیش بـه وێنـه‌ی خێوه‌تێكی مـه‌زنی شـین ده‌بینێـت كـه لـه‌و ده‌شـتایی‌یه‌دا هـه‌ڵدرابێت و، نـاو خێوه‌ته‌كـه‌ش بـه چراخان ڕازابێته‌وه و ئارایشت درابێت و، چیاكانیشی به وێنه‌ی ستوون و مێخی ئه‌و خێوه‌تـه مه‌زنه لـێ ده‌رده‌كه‌وێت كه بازنه‌ی ئاسۆیان له باوه‌شدایه و لوتكه‌كانیشیان له داوێنی ئاسمـان گیر كردووه! ئـه‌و شـاعیره كـه ئـه‌م دیمه‌نـه لـه‌م گوفتـاره‌دا ده‌بینێـت نوقمـی سه‌رسـامی و سه‌رسووڕمان ده‌بێت و، ته‌قدیسی كردگاری مه‌زنی ده‌كات.

مرۆڤی ڕه‌وانگۆی ده‌شته‌كیش به‌شی له‌م گوفتاره‌دا ئه‌وه‌نده‌یه كه:

ڕووی زه‌وی به ده‌شتایی‌یه‌كی فراوان ده‌بینێت و، زنجیره‌ی چیاكانیش له به‌رچاوی‌دا وه‌ك زنجیره خێوه‌تێكی دوور و درێژ ده‌نوێنێت كه هی گه‌لـێ به‌دیهاتووی جۆراوجۆر بن، ته‌نانـه‌ت چینی گڵ به‌لایه‌وه بریتی‌یه له چـادرێك كـه به‌سـه‌ر ئـه‌و مێـخ و ستوونه بڵندانـه‌دا هـه‌ڵدراوه و ئـه‌وانیش بـه نـووكـه تیژه‌كانیـان هـه‌ڵیان بڕیـوه و بـه‌رزیان كردووه‌تـه‌وه و، كردوویانـه بـه نیشـته‌جێی جیاجیـای گه‌لـێ بوونـه‌وه‌ری زۆری جۆراوجـۆر.. بـه‌ڵێ، ئـه‌و بـه‌م جـۆره لێـی تێ‌ده‌گات و، له تاوا سوژده‌ی سه‌رسامی و حه‌په‌سان بۆ ئه‌و به‌دیهێنه‌ره مه‌زنه ده‌بات كـه ئـه‌و به‌دیهاتووه گه‌ورانه‌ی به وێنه‌ی خێوه‌تی داكوتاو له‌سه‌ر زه‌وی‌دا به‌دی‌هێناوه!

به‌شی جوگرافیازانی ئه‌دیبیش له‌م گوفتاره‌دا ئه‌وه‌یه كه:

گۆی زه‌وی به‌لایه‌وه بریتی‌یه له كه‌شتی‌یه‌ك به‌ناو زه‌ریـای هـه‌وادا ده‌ڕوات و، چیاكـانیش چه‌ند مێخێكن بۆ مه‌به‌ستی مه‌حكه‌م‌كردن و ڕاگرتنی هاوسه‌نگی به‌و كه‌شتی‌یه‌دا داكوتراون. به‌ڵێ، بابای جوگرافی‌زان ئاوا بیر ده‌كاته‌وه و، ئیتر له به‌رده‌م گه‌وره‌یی ئه‌و به‌توانا خاوه‌ن كه‌ماڵه‌ی كه گۆی زه‌به‌لاحی زه‌ویی كردووه به كه‌شتی‌یه‌كی ڕێكوپێك و ئێمـه‌ی تێدا سـوار كردووه تاكو به ئاسۆكانی جیهاندا بمانگێڕێت، ده‌ڵێت: "سبحانك ما أعظمَ شأنَكَ"!

به‌شـی ئـه‌و كه‌سـه‌ش كـه لـه كاروبـاری كۆمـه‌ڵدا پسـپۆڕه و شـاره‌زای داخوازی‌یـه‌كانی شارستانێتیی نوێ‌یه، ئه‌وه‌یه كه:

زه‌وی به "خانه و لانه"یـه‌ك ده‌زانێـت و، سـتوونی ژیـانی ئـه‌م خانه‌یـه‌ش ژیـانی گیـاندارانی ناوه‌یه‌تی و، مایه‌ی ئه‌و ژیانه‌ش: ئاو و گڵ و هه‌وایه، كه مه‌رجـه‌كانی ژیـانن. خۆ ستوونی ئـه‌م سیانه‌ش چیاكانن، چونكه چیاكان: عه‌مباراوی "ئاو"ه‌كـان و.. پاڵێوگـه‌ی "هـه‌وا"ن، ئه‌وه‌تا گازه زیانبه‌خشه‌كان ده‌نیشێنن و.. پارێزه‌ری "گڵ"ی زه‌ویشن، چونكه لـه زاڵبوونـی ده‌ریـا و قـوڕ و لیتـه‌كانی ده‌پـارێزن و.. گه‌نجینـه‌ی گشـت داخوازی‌یه‌كانی ژیـانی ئـاده‌میزادن. ئـه‌م مرۆڤـه بـه‌م جـۆره لێـی تێ‌ده‌گـات و، ئیـتر سـوپاس و ته‌قدیسـی ئـه‌و كردگـاره شـكۆمه‌ند و به‌خشنده‌یه ده‌كات كه ئه‌م چیـا كه‌تـه و زه‌به‌لاحانـه‌ی كـردووه بـه مێـخ و گه‌نجینـه‌ی ڕۆزی و گوزه‌رانی ئێمه، له‌سه‌ر ڕووی ئه‌م زه‌وی‌یه‌ی كه "خانه"ی ژیانمانه.

به‌شی "فه‌یله‌سووفێكی سروشتی"ش له‌م گوفتاره‌دا ئه‌وه‌یه كه:

دەزانێت ئەو تێکەڵبوون و ئالوگۆڕ و بوومەلەرزانەی لە ناخی زەوی‌دا ڕوو دەدەن، لە ڕێی قوت بوونەوەی شاخەکانەوە هێور دەبنەوە. کەواتە چیاکان هۆکارێکن بۆ هێمنیی زەوی و ئارام بوون و لەنگەرگرتنی لە دەوری تەوەرەی خۆی و لانەدانی لە خولگە ساڵانەکەی. وەك بڵێی زەوی لە کلاوڕۆژنەی چیاکانیەوە هەناسە دەدات و توورەیی و توندوتیژیی ناو ناخی کەم دەبێتەوە.. ئەم فەیلەسووفە سروشتی‌یە، بەم چەشنە لەم ئایەتە تێ‌دەگات و دڵنیا دەبێت، ئیتر دێتە ناو بازنەی ئیمانەوە و دەڵێت: "الحِكمة لله".

❍ نموونەیەکی تر:

﴿... أَنَّ السَّموات والأَرْضَ كانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ (الأنبياء: ٣٠).

وشەی: "رتقــاً"ی ئەم ئایەتە، بۆ کەسێك لەکەی فەلسەفەی بەرنەکەوتبێت، ئەوە دەگەیەنێت کە:

ئاسمان لە پێشدا سامال و بێ هەور و، زەویش وشك و برنگ و بێ گیان بووە. جا ئەو کەسەی کە دەرگاکانی ئاسمانی بە باران خستە سەر پشت و ڕایەخی سەوزەلانیشی بە ڕووی زەوی‌دا ڕاخست، هەر ئەوە کە سەرجەم زیندەوەرانی لەو ئاوە بەدی هێناوە، تەنانەت دەڵێی جۆرە جووت‌بوون و پیتاندن(تەلقیح)ێك لە نێوانیاندا ڕووی داوە! خۆ ئەم کارەش تەنها هی ئەو خاوەن توانستە شکۆمەندەیە کە ڕووی زەوی بەلایەوە وەك بێستانێکی بچووك وایە و، ئەو هەورانەش کە ڕووی ئاسمان دادەپۆشن ئاودێری ئەو بێستانەین.. ئەو کەسە، ئاوا لەم وشەیە تێ‌دەگات و، ئیتر لە بەردەم گەورەیی توانستی خوادا سەری سوژدە دەخاتە سەر زەوی.

هەر هەمان وشەی "رتقاً" بۆ زانای گەردوونناس ئەوە دەگەیەنێت کە:

لە سەرەتای دروستبوونی گەردووندا ئاسمان و زەوی دوو بارستایی بێ شکڵ و شێوە و دوو هەویری تازە و تەڕی بێ‌سوود بوون. جا لەو کاتەدا کە ئەم دوو مادەیە هیچ بەدیهاتوویەکیان تێدا نەبووە و کەسیش لە سەریاندا هاتوچۆی نەکردووە، بەدیهێنەری دانا بە شێوەیەکی جوان ڕایخستن و، گەلێ شێوەی بەسوود و ئارایشتی ڕەنگین و بەدیهاتووی زەبەندەی پێ بەخشین. ئەو زانایە بەم جۆرە لەم وشەیە دەگات و، ئیتر لە بەردەم فراوانیی دانستی خوای گەورەدا تووشی سەرسووڕمان دەبێت.

هەر ئەم وشەیە سەبارەت بە فەیلەسووفە هاوچەرخەکانەوە ئەوە دەگەیەنێت کە:

گۆی زەویمان و هەسارەکانی تریش، کە کۆمەڵەی خۆر پێکدەهێنن، لە پێشدا بە وێنەی هەویر لەگەڵ خۆردا تێکەڵ بوون و هێشتا ڕانەخرابوون. بەڵام پاش ئەوە، خوای گەورەی خاوەن توانست و ڕاگیرکەری گەردوون ئەو هەویرەی لە یەك جیا کردەوە و، هەر یەك لەو ئەستێرە و هەسارە گەڕۆکانەی لە شوێنی خۆی‌دا دانا، "خۆر" لەوێ و "زەوی" لێرە و... هتد.. ئنجا ڕایەخی گڵی بەسەر زەوی‌دا ڕاخست و، لە ئاسمانەوە بارانی بۆ باراند و،

ڕووناکیشی لە خۆرەوە بەسەردا پەخشاند و، مرۆڤی تێدا نیشتەجێ کرد.. ئەو فەیلەسووفە بەم جۆرە لەم وشەیە تێدەگات و، ئیتر سەری لە زۆنگاوی سروشت دەردەهێنێت و دەڵێت: "آمنت بالله الواحد الأحد"!

❍ نموونەیەکی تر:

﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا﴾ (يس:٣٨).

"لام"ی ﴿لِمُسْتَقَرٍّ﴾ واتای خودی "لام" و واتای "في" و واتای "إلى""ش دەگەیەنێت..

کەسانی عەوام بە واتای "إلى" لەم "لام"ە تێدەگەن، واتە:

ئەو خۆرەی کە گەرمی و ڕووناکیتان پێ دەبەخشێت، بەرەو شوێنی گیرسانەوەی خۆی دەڕوات و ڕۆژێك دێت کە دەیگاتێ و، ئەو کاتەش چ سوودێکتان پێ ناگەیەنێت.. ئەو کەسە، بەم تێگەیشتنەی خۆی، یادی ئەو نیعمەتە مەزنانە دەکاتەوە کە خوای گەورە بەستوونی بە خۆرەوە. ئیتر سوپاس و تەقدیسی پەروەردگاری خۆی دەکات و دەڵێت: "سبحان الله، الحمد لله".

هەر ئەم ئایەتە "لام"ەکەی بە واتای "إلى" پیشانی مرۆڤی زاناش دەدات، بەڵام نەك بەو واتایەی کە خۆر تەنها سەرچاوەی ڕووناکییە، بەڵکو بەو واتایەی کە خۆر وەك "مەکووك"ی ئەو چنراوە پەروەردگارییانە وایە کە لە کارگەی بەهار و هاویندا دەچنرێن و، مەرەکەبێکی "نوور"ە بۆ نووسراوە صەمەدانییەکانی خواوەند کە لەسەر لاپەڕەی شەو و ڕۆژدا دەنووسرێن.. مرۆڤی زانا بەم جۆرە تەسەووری دەکات و، بە وردی سەرنج لە ڕێسای ناوازەی ئەو جیهانە دەدات کە جموجووڵی ڕواڵەتیی خۆر ئاماژەی بۆ دەکات. ئیتر لە بەردەم حیکمەتی کردگاری دانادا سەری دەخاتە سوژدە و دەڵێت: "ماشاء الله.. تبارك الله".

سەبارەت بە گەردوونناسیش، ئەوا بە واتای "في" لەم "لام"ە تێدەگات. واتە: خۆر بە وێنەی زەمبەلەکی کاتژمێر و بە خولانەوەیەکی تەوەرەیی بە دەوری خۆیدا، جموجووڵی کۆمەڵەکەی ڕێك دەخات. ئیتر لە بەردەم ئەم کردگارە شکۆمەندەی کە ئەم چەشنە سەعاتە مەزنەی بەدی هێناوە دووچاری سەرسوورمان و حەپەسان دەبێت و لەتاوا دەڵێت: "العظمة لله والقدرة لله" و، دەست لە فەلسەفە هەڵدەگرێت و دێتە ناو مەیدانی حیکمەتی قورئانەوە!

هەر ئەم "لام"ە، زانای وردکار واتای "عیللەت" و واتای "ظرفية"ی لێ دەداتەوە..

واتە: کردگاری دانا هۆکارە ڕواڵەتییەکانی کردووە بە پەردە لە ڕووی کاروبارەکانی خۆیدا. ئەوەتا هەسارەکانی بە یاساکەی خۆی کە پێی دەوترێت: "جازیبییەت" بە خۆرەوە پەیوەست کردووە و، هەر بەو یاسایەش هەسارە زۆر و زەبەندەکانی بە چەندین جموجووڵی جۆراوجۆری ڕێکوپێك بەگەڕ خستووە و، خولانەوەی خۆریشی بە دەوری تەوەرەکەیدا کردووە بە هۆکارێکی ڕواڵەتیی بەرهەمهێنانی ئەو جازیبییەتە. واتە: مانای ﴿لِمُسْتَقَرٍّ﴾ ئەوەیە کە خۆر: "تجري في مستقر لها لاستقرار منظومتها"! چونکە "جووڵە" گەرمی بەرهەم

دەهێنێت و، "گەرمی"ش هێز و، "هێز"یش جازیبییەتی ڕواڵەتی بەرهەم دەهێنێت. ئەمەش قانوونێکی پەروەردگاری و یاسایەکی خواییە.. ئیتر ئەم دانا وردەکارە، ئەم چەشنە حیکمەتە لە تەنها یەك پیتی قورئانی حەکیم وەردەگرێت و، دەڵێت: (الحمد لله، حیکمەتی ڕاستەقینە هەر تەنها ئەوەیە کە لە قورئاندایە و، لەمەولا چیی‌تر بایەخ بە فەلسەفە نادەم)!

ئەو کەسەش کە خاوەنی دڵ و بیری شاعیرانەیە، لەم "لام" و "ئیستیقرار"ەوە ئەم واتایە تێ‌دەگات کە:

"خۆر" درەختێکی نوورانی‌یە و هەسارەکانی دەوروبەریشی بەروبوومە گەشتیارەکانی ئەون. کەواتە خۆر - بە پێچەوانەی درەختەکانی تر - ڕادەپەڕێت و دەجووڵێت تاکو بەروبوومەکانی هەڵنەوەرێن! گەر وا نەکات، بەروبوومەکانی هەڵدەوەرن و پەرتەوازە دەبن!

دەشتوانیت بە ئەندێشە "خۆر" وەك سەرحەڵقەی زیکرێك ببینیت کە بە وێنەی عاشقێکی شەیدا لە ناوەڕاستی ئەو حەڵقەیەدا زیکری خوا بکات، تەنانەت دەبینیت حاڵ و جەزبەشی لەوانەی دەوری خۆی هێناوە!

هەر بەم واتایە لە پەیامێکی ترمدا وتوومە:

بەڵێ، خۆر درەختێکی بەردارە، بۆ ئەوە ڕادەپەڕێت کە بەری خۆش و بەتام و لەزەتی هەسارەکانی دانەکەون و هەڵنەوەرێن. خۆ ئەگەر لە شوێنی خۆی‌دا بە بێ دەنگی ڕابوەستایە و نەجوولایە، ئەوا کێشی نێوان خۆی و هەسارەکان نەدەما و، ئەو هەسارە شەیدا و ڕێك و پێکانەش بە ناو بۆشایی فراوانی ئاسماندا پەرتەوازە دەبوون و لە تاو هەڵوەرین و زایەبوونیان هاواریان لێ هەڵدەسا!

○ نموونەیەکی تر:

﴿وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (البقرة: ٥).

ئەم ئایەتە "سکووت" و "ئیطلاق"ی تێدایە، چونکە دەستنیشانی نەکردووە کە ئەوانە بە چ پاداشتێك دەبن بە "موفلیح". تاکو هەموو کەسێك لەم سکووتەدا بگات بە ئامانج و ئاواتی خۆی! واتە ئەم ئایەتە گوفتارەکەی کورت دەکاتەوە تاکو واتای فراوان بە دەستەوە بدات! چونکە:

ئامانجی هەندێك لەوانەی کە ئەم گوفتارەیان ئاراستە کراوە: ڕزگار بوونە لە دۆزەخ و.. هەندێکی تر تەنها بیر لە بەهەشت دەکەنەوە و.. کۆمەڵێکی تر ئاواتەخوازی بەختەوەریی هەمیشەیین و.. بەشێکی‌تر تەنها ئومێدەواری بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوان و.. ئەوپەڕی ئاواتی هەندێکی تریش بینینی خوای گەورەیە. قورئانی پیرۆزیش ئەم گوفتارەی ئاوا بە "موتلەق"ی هێشتەوە تاکو واتاکەی گشتی بێت و، "حەزف"ی تێدا کردووە تاکو واتای

زۆر بە دەستەوە بدات و، بە كورتی و پوختیـش هێناویـەتی بـۆ ئـەوەی هـەموو كەسێك بەشی خۆی تێدا ببینێت!

بەم جۆرە وشەی ﴿المفلحون﴾ لێرەدا ئەوە دەستنیشان ناكات كە بە چی دەبن بە "موفلیح (واتە: ئەوانە چ پاداشتێكیان دراوەتەوە وا بە "موفلیح" ناو بـراون)؟ وەك بلێـی ئـەم ئایەتـە بـەم بێدەنگی‌یەی پێیان بلێت: موسلمانان مژدەبێ!.. ئەی كاكی موتتـەقی! لـە دۆزەخ ڕزگـارت دەبێت.. ئەی خواپەرستی پیاوچاك! لە بەهەشتدا ڕزگاری و سەرفرازی بەدەست دەهێنیت.. ئەی كاكی خواناس! ڕەزامەندیی خوات دەستگیر دەبێت.. ئەی شەیدای جوانیـی خـواوەنـد! تۆ بە دیتنی خواوەند بەهرەمەند دەبیت... هتد.

لە نێوان هەزاران نموونەدا تەنها یەك نموونەمان لە قورئانی پیرۆز هێنایەوە بـۆ هـەر یـەك لـە: جامیعییـەتی لـەفز و، گوفتـار و، وشـە و، پیـت و، سـكووت. دەسا تـۆش بـۆ خـۆت قیاسـی "ئایەت" و "چیرۆك"یش لەسەر ئەمانە بكە.

○ نموونەیەكی تر:

﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ واسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ﴾ (محمد:١٩).

ئەم ئایەتە گەلـێ پلە و ڕووی زۆر و زەبەندەی تێدایە، تەنانـەت گشـت چینـەكانی ئـەولیا، لـە هـەموو هۆكـارە جیاجیاكـانی سـلووك و پلـە جۆراوجۆرەكانیـاندا، دابـین بوونـی پێداویستی‌یەكانی خۆیان تەنها لەم ئایەتـەدا دیوەتـەوە و، هەریەكـەیان خۆراكێكی مەعنـەویی لـێ وەرگرتووە كە شایانی ئەو پلەیـەی ئـەو بێـت. چونكـە لـەفزی: "الله" نـاوێكی جامیعـە بـۆ هەموو ناوە جوانەكانی خوای گەورە و، بە ئەندازەی ژمارەی هـەموو "ناوەكـان" جۆرەكـانی "تەوحید"یشی تێدایە، واتە: "لا رزّاق الاّ هو.. لا خالق الاّ هو.. لا رحمن الاّ هو...." هتد.

○ نموونەیەكی تر:

چـیرۆك و بەسـەرهاتی حـەزرەتی مووسـا – درووەدی لەسـەر بێـت – كـە یەكێكـە لـە چیرۆكەكانی قورئان، بە ئەندازەی ئـەو سـوودانەی لـە عەساكەی حـەزرەتی مووسـادا هـەن، دەرس و پەندی تێدایە..

چـونكـە ئـەم چیرۆكـە: دڵدانـەوە و دڵنیـا كردنـی پێغەمبـەر ﷺ و.. هەڕەشـە كـردن لـە كافران و.. دەرخستنی چەپەڵیی موونافیقان و.. سەرزەنشتی جوولەكە و.. چـەندین مەبەستی تـری وەك ئەمانـەی تێدایـە. كەواتـە گەلـێ ڕووی زۆری هەیـە، بۆیـە لـە چـەند سـوورەتێكدا دووپات بووەتـەوە. جـا هەرچـەند لـە هـەموو شـوێنێكی باسـكردنی ئـەم چیرۆكـەدا گشـت ئامانج و مەبەستەكان ڕەچـاو كـراون و هـەموویان بەدەستەوە دەدەن، لەگـەڵ ئەوەشـدا تەنـها یەكێك لەو ئامانجانە لەو شوێنەدا جێی مەبەسـتە و ئامانجـەكانی تـر لـەوێدا شـوێنكەوتەی ئـەو ئامانجە سەرەكی‌یەن.

**ئەگەر دەڵێیت:**

چۆن بزانین قورئانی پیرۆز گشت ئەو واتایانەی مەبەستە کە لە نموونەکانی پێشوودا باس کران و، بە چیدا دەزانین ئاماژەیان بۆ دەکات؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

مادەم قورئـانی پیرۆز ڕێنمـایی و گوفتـارێکی ئەزەلییـە و، خـوای گـەورە ئاراستەی چینـە جۆراوجۆرەکـانی گـرۆی مرۆڤی دەکـات کـە لـە پشتی چـەرخ و سـەردەمەکانەوە ڕیزیـان بەستووە، ئـەوا دەبێ گەلـێ واتـای زۆری تێدا دابنرێت، تـاکو لەگـەڵ ئاستە جیاجیاکـانی تێگەیشتندا بگونجێت و، گەلـێ نیشـانەش لەسـەر ئـەوە دادەنێـت کـە ئـەو واتایانـە هـەموویان مەبەستن.

لە کتێبی "إشارات الإعجاز"دا ئەو واتایانەی کە لێرەدا باس کران و واتا زۆرەکـانی تـری وشەکانی قورئانمـان هێنـاوە و، بـەپێی دەستوورەکانی عیلمـی: (صـەرف و نـەحو و بـەیان و مەعانی) و یاساکانی: ڕەوانبێژی، چەسپاندوومانن.

وێـڕای ئەمـەش، هەمـوو ئـەو واتـا و ڕووانـەی کـە بـەپێی زانسـتەکانی زمـانی عـەرەبی ڕاسـتن و، بـە پێوانـەی زانسـتی ئوصـوولی دیـن تـەواون و، لـە هونـەری "مـەعانی"شـدا وەردەگیرێن و، لە زانستی "بەیان"دا شیاون و، ڕەوانبێژیش بە لایەوە پەسندن، هـەموو ئەوانـە، بە یەکدەنگیی: موجتەهیدان و تەفسیرنووسان و زانایانی ئوصوولی دیـن و ئوصوولی فیقهـ و، بە شایەتیی جیاوازیی ئیجتهاد و بۆچوونەکانیان.. بەشێکن لە واتاکانی قورئانی پیرۆز. ئەوەتا قورئان بۆ هەموو یەکێك لەو واتایانە و هەریەکەشیان بەپێی پلەی خـۆی نیشـانەیەکی دانـاوە. ئـەم نیشـانەیەش یـان "لـەفزی"یـە یـان "مەعنـەوی". نیشـانە مەعنەوییەکـەش یـان "سـیاق"ی ڕستەکەیە، یان "سیباق"ی گوفتارەکەیە، یان نیشانەیەکی ترە کە ئاماژە بۆ ئەو واتایە دەکات.

ئەو سـەدان هـەزار کتێبی تەفسـیرەی کـە هـەندێکیان گەیشتوونەتە هەشـتا بـەرگ[1] و، چەندین زانای لێکۆڵەر دایانناون، بەڵگەیەکی گومـانبڕی درەخشـانن لەسـەر جامیعییـەت و دەراسایی وشەکانی قورئان!

بە هەرحاڵ.. گەر ئێمە لەم وتەیەدا بە درێژی لە نیشانەکانی هەموو یەکێك لەو واتایانـەی قورئان – بـە دەسـتوور و یاسـاکانیەوە – بکۆڵینـەوە، ئـەوا ئـەم وتەیـە درێـژە دەکێشـێت. بۆیـە لێرەدا بە پوختی لێی دواین و، درێژەی ئەم باسە بە "إشارات الإعجاز" دەسپێرین.

---

(١) تەنانەت "تەفسیری ئەدفەوی" کە ناوی "الاستغناء في علم القرآن"ە و، لە لایەن محەممەدی کوڕی عەلیی کوڕی ئەحمەدی موقریئی نەحوی کە لە ساڵی (٣٨٨ك)دا کۆچی دوایی کردووە، دانراوە، لە سەد و بیست بەرگدایە و بە ماوەی دوازدە ساڵ دایناوە! بڕوانە: "کشف الظنون"ی حاجی خەلیفە ١/٣٠٩ ط١ – استانبول. (وەرگێڕ)

**بریسکانەوەی دووهەم:**

**جامیعییەتی دەراسا لە "واتاکان"ی قورئاندا.**

بەڵێ، قورئانی پیرۆز لە گەنجینەی "واتا" مەزنەکانیەوە: سەرچاوەی گشت موجتەهیدان و.. چێژی هەموو خواناسان و.. مەشرەبی هەموو بەخواگەیشتووان و.. ڕێبازی گشت کامڵان و.. ڕێڕەوی سەرجەم لێکۆڵەرانی بەخشیوە! جگە لەوەش هەموو کاتێك هەر قورئان ڕێنما و ڕابەری بەرزبوونەوە و پێگەیشتنیان بووە و، لە گەنجینە نەبڕاوەکەشیەوە نوورە درەخشانەکانی خۆی ئاراستە کردوون. هەروەك هەموویان لەسەر ئەمە یەکیان گرتووە و دانیان پێدا ناوە و تێکڕا تەصدیقیان کردووە!

❐ **بریسکانەوەی سێهەم:**

**جامیعییەتی دەراسا لە "زانیاری"ی قورئاندا.**

بەڵێ، هەروەك زانیاری‌یە زۆر و زەبەندەکانی "شەریعەت" و، زانستە جۆراوجۆر و زۆرەکانی "حەقیقەت" و، زانیاری‌یە جیاجیا و بێ‌سنوورەکانی "تەریقەت" بە خوڕی و لێشاو لە دەریای زانستەکانی قورئانەوە جۆگەلەیان بەستووە.. بە هەمان جۆر: حیکمەتی ڕاستەقینەی بازنەی "مومکینات" و، زانستە حەقیقی‌یەکانی بازنەی "وجووب" و، زانیاری‌یە تەماوی‌یەکانی بازنەی "ئاخیرەت"یش، بەوپەڕی سەخاوەت و ڕێکوپێکی و خوڕی، لە هەمان دەریاوە سەرچاوەیان گرتووە.

خۆ ئەگەر بمانەوێت نموونەیەك بۆ ئەم بریسکانەوەیە بهێنینەوە ئەوا پێویستمان بە نووسینی بەرگێکی تەواو دەبێت! بۆیە تەنها "بیست و پێنج وتەکانی پێشوو" لەسەر ئەمە بە نموونە دەهێنینەوە. بەڵێ، حەقیقەتە ڕاستەکانی هەر بیست و پێنج وتەکان، تەنها بیست و پێنج دڵۆپی دەریای زانیاریی قورئانن. خۆ ئەگەر هەر ناتەواوی‌یەك لەو وتانەدا ببێت، ئەوا دڵنیابە کە تەنها هی تێگەیشتنی کەم و کۆتا و ناتەواوی خۆمە.

❐ **بریسکانەوەی چوارەم:**

**جامیعییەتی دەراسا لە "باسەکان"ی قورئاندا.**

بەڵێ، قورئانی پیرۆز گشت ئەو باس و بابەتە هەمەکی‌یانەی لەخۆدا کۆ کردووەتەوە کە تایبەتن بە: مرۆڤ و ئەرکی سەرشانی و، گەردوون و بەدیهێنەری و، زەوی و، ئاسمان و، دنیا و، قیامەت و، ڕابوردوو و، داهاتوو و، ئەزەل و، ئەبەدەوە..

جگە لەمانەش، گەلێ باسی بنەڕەتی و گرنگی تری لەخۆ گرتووە: هەر لە باسی سەرەتای دروستبوونی مرۆڤ و قۆناغی "نوتفە"وە تا دەڕواتە ناو گۆڕ و.. لە ئادابی خەو و خواردنیەوە تا دەگاتە باسەکانی قەزا و قەدەر و.. لە بەدیهێنانی جیهانەوە بە ماوەی شەش ڕۆژ تا دەگاتە کارمەندی‌یەکانی هەڵکردنی (با) کە سوێندەکانی "والمرسلات" و "والذاریـــات" ئاماژەیان بۆ دەکەن و.. هەر لە دەستتێوەردانی خواوەندەوە لە دڵ و ویست و ئیرادەی

مرۆڤ، کە ئەمەش ئایەتە پیرۆزەکانی: ﴿وَمَا تَشاؤُنَ إلاّ أن يَشاءَ اللهُ﴾ (التكوير:٢٩) و ﴿يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ﴾ (الأنفال:٢٤) ئاماژەی بۆ دەکەن، تا دەگاتە: ﴿وَالسَّموات مَطويَّاتٌ بِيَمينِهِ﴾ (الزمر:٦٧) و.. هەر لە ﴿وَجَعَلْنا فيها جَنَّاتٍ مِنْ نَخيلٍ وَأعْناب﴾ (يس:٣٤)ەوە تا ئەو حەقیقەتە سەرسووڕهێنەی کە ئەم ئایەتە دەری دەبڕێت: ﴿إذا زُلْزِلَتِ الأَرْضُ زِلْزالَها﴾(الزلزلة:١) و.. لەو حاڵەتەی ئاسمانەوە کە: ﴿ثُمَّ اسْتَوى إلى السَّماءِ وَهِيَ دُخانٌ﴾(فصلت:١١) تا دەگاتە لەتوپەت بوونی ئاسمان و کەوتن و پەرتەوازە بوونی ئەستێرەکانی لە بۆشایی بێ سنووردا و.. هەر لە کردنەوەی دەرگای دنیا بۆ تاقیکردنەوە تا تەواوبوونی ماوەی ئیمتیحان و.. هەر لە گۆڕەوە کە یەکەم مەنزڵی ئاخیرەت و بەرزەخ و حەشر و سیراتە، تا دەگاتە بەهەشت و بەختەوەریی هەمیشەیی و.. لە ڕووداوە دێرینەکانی سەردەمی بەدیهاتنی حەزرەتی ئادەم - دروودی لەسەر بێت - و ململانێی نێوان دوو کوڕەکانیەوە، تا دەگاتە تۆفان و، لەناوچوونی قەومی فیرعەون و، بەسەرهات و ڕووداوە مەزنەکانی زۆربەی پێغەمبەران، درووديان لەسەر بێت و.. هەر لەو بەسەرهاتە ئەزەلی‌یەی: ﴿ألَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ ەوە (الأعراف:١٧٢) تا دەگاتە ئەو ڕووداوە ئەبەدی‌یەی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ ناضِرَةٌ ۞ إلى رَبِّها ناظِرَةٌ﴾ (القيامة:٢٢-٢٣)!

قورئانی پیرۆز هەموو ئەم بابەت و باسە گرنگانە بە شێوەیەك ڕوون دەکاتەوە شایستەی زاتی مەزنی ئەو پەروەردگارە شکۆمەندە بێت کە ئەم گەردوونە هێندە بە ئاسانی بەڕێوە دەبات وەك بلێی کۆشکێك بێت و.. دنیا و ئاخیرەتیشی بەلاوە وەك دوو ژوور وان بە ئاسانی دەرگای یەکێکیان دەکاتەوە و هی ئەوی تریشیان دادەخات و.. بە وێنەی دەستکاری کردنی بێستانێکی بچووك دەستکاریی گۆی زەوی دەکات و.. بە وێنەی بن‌میچێکی چراخانیش دەست لە ئاسمانەکان وەردەدات و.. وەك دوو لاپەڕەی ئامادە و پێش‌چاو بەسەر "ڕابوردوو" و "داهاتوو"دا دەڕوانێت و وەکو شەو و ڕۆژ وان لە بەردەمی‌داو.. "ئەزەل" و "ئەبەد"یش بە وێنەی ئەمڕۆ و دوێنێ دەبینێت و، وەك کاتی "ئێستا" وان بەلایەوە کە کاتێکە پەیوەستەی هەردوو سەری زنجیرەی کاروبارە خوایی‌یەکانە..

هەروەك ئەندازیارێك، کە دوو کۆشکی بنیات نابێت، لە بارەی ئەو دوو کۆشکە و بەڕێوەبردنیانەوە دەدوێت و، لاپەڕەیەکی کارنامە و پێڕستێك بۆ سیستەمەکەیان دادەنێت.. بە هەمان جۆر، قورئانی پیرۆزیش گوفتارێکی ڕوونی وەهایە کە شایستەی کەسێکە ئەم گەردوونەی بەدی هێناوە و بەڕێوەی دەبات و لاپەڕەی کارنامە و پێڕستی پرۆگرامەکانی نووسیوە و دەری خستووە، گەر ئەم تەعبیرە دروست بێت..

ئەوەتا لە هیچ لایەکەوە هیچ شوێنەوار و جێ‌دەستێکی تەصەنوع و تەکەللوفی تێدا نابینرێت، هەروەك هیچ نیشانەیەکی ئەوتۆشی تێدا نی‌یە کە دەری بخات لاسایی گوفتاری

كه‌سێكی تری كردبێته‌وه‌، یان خۆی له‌ غه‌یری شوێنی خۆی‌دا ده‌ربخات و هیچ فێلێكی تری وه‌ك ئه‌مانه‌ی هه‌رگیز تێدا نی‌یه‌.

كه‌واته‌ قورئانی پیرۆز له‌وپه‌ڕی جیددی و بێ گه‌ردی‌دایه‌ و ساف و بریسكاوه‌ و ڕوون و دره‌خشانه‌. چونكه‌ هه‌روه‌ك ڕووناكیی خۆر به‌ زمانی حاڵ ده‌ڵێت: "من له‌و خۆره‌وه‌ په‌یدا بووم". قورئانیش به‌ هه‌مان جۆر ده‌فه‌رموێ: "من گوفتار و به‌یانی به‌دیهێنه‌ری جیهانم".

به‌ڵێ، جگه‌ له‌و كردگاره‌ شكۆمه‌ند و نیعمه‌ت به‌خشه‌ چاكه‌كاره‌ی كه‌ ئه‌م دنیایه‌ی به‌ سنعه‌ته‌ به‌نرخه‌كانی ڕازاندووه‌ته‌وه‌ و له‌ نیعمه‌ته‌ خۆش و به‌له‌زه‌ته‌كانی خۆی پڕی كردووه‌ و، به‌وپه‌ڕی ناوازه‌یی و چاكه‌كاری و ڕێكوپێكی، به‌دیهاتووه‌ ناوازه‌كانی و نیعمه‌ته‌ به‌نرخه‌كانی خۆی به‌سه‌ر ڕووی زه‌وی‌دا بلاوكردووه‌ته‌وه‌.. كێ هه‌یه‌ - جگه‌ له‌و - خاوه‌نی "به‌یان"ی ئه‌م قورئانه‌ پیرۆزه‌ بێت كه‌ دنیای له‌ ته‌قدیر و ته‌عزیم و ئیستیحسان و سه‌رسووڕمان و سوپاس و ستایش پڕ كردووه‌، ته‌نانه‌ت گۆی زه‌ویشی كردووه‌ به‌ ته‌كیه‌ی زیكر و مزگه‌وتێك كه‌ ناوی خوای تێدا به‌رز ده‌كرێته‌وه‌ و پیشانگایه‌كیش بۆ پێش چاو خستنی سنعه‌ته‌ ناوازه‌كانی ناوه‌كانی خوای گه‌وره‌؟!

ده‌بێ كێ بێت جگه‌ له‌و خاوه‌نی ئه‌م گوفتاره‌ بێت؟! یان كێ ده‌توانێت لافی خاوه‌نێتیی ئه‌م گوفتاره‌ لێ بدات؟ ئایا ده‌گونجێت ئه‌و "ڕووناكی"یه‌ی كه‌ دنیای له‌ نوور پڕ كردووه‌ هی شتێكی تری غه‌یری "خۆر" بێت؟! یان ئایا ده‌بێ نووری "به‌یان"ی قورئان، كه‌ مه‌ته‌ڵی جیهانی شیته‌ڵ كرد و ڕووناكیشی به‌ گه‌ردوون به‌خشی، گوفتاری كێ بێت جگه‌ له‌ به‌دیهێنه‌ری ئاسمانه‌كان و زه‌وی؟ یان كێ پڕكێشی ده‌كات لاسایی بكاته‌وه‌ و ده‌توانێت شتێكی هاووێنه‌ی قورئان بهێنێت؟

به‌ڵێ، ئه‌و كردگاره‌ی كه‌ ئه‌م دنیایه‌ی به‌ داهێنانی ناوازه‌ی سنعه‌تی خۆی ئارایشت داوه‌، مه‌حاڵه‌ له‌گه‌ڵ ئه‌م مرۆڤه‌دا نه‌دوێت كه‌ له‌ به‌رده‌م سنعه‌ت و داهێنانه‌كه‌ی ئه‌ودا گرفتاری سه‌رسامی بووه‌! جا مادەم ئه‌و كردگاره‌ خاوه‌نی: "كار" و "زانین"ه‌، ئه‌وا بێ گومان خاوه‌نی: "دوان و قسه‌كردن"یشه‌. خۆ مادەم ده‌دوێت، ئه‌وا جگه‌ له‌ قورئان هیچ شتێكی تر شایانی ئه‌وه‌ نی‌یه‌ كه‌ گوفتاری ئه‌و بێت! ئایا ئه‌و خاوه‌ن موڵكه‌ی كه‌ بایه‌خ به‌ ڕێكخستنی گوڵێكی بچووك له‌ موڵكی خۆی‌دا ده‌دات، چۆن بایه‌خ به‌ گوفتارێك نادات كه‌ سه‌رانسه‌ری موڵكی ئه‌وی كردووه‌ به‌ كۆڕی ته‌هلیل و جه‌زبه‌ی زیكر و ده‌مپاراو به‌ یاد و ستایشی ئه‌و؟ یان ئایا ده‌گونجێت له‌ شان و شكۆی ئه‌م گوفتاره‌ بڵنده‌ بهێنێته‌ خوار و به‌ هی یه‌كێكی تری غه‌یری خۆی دابنێت؟!

**□ بریسکانەوەی پێنجەم:**

**جامیعییەتی دەراسا لە "شێواز و کورتکردنەوەکانی" قورئاندا.**

"ئەم بریسکەیە پێنج ڕووناکیی لێ بووەتەوە":

*ڕووناکیی یەکەم:*

شێوازی قورئان جامیعییەتێکی سەرسووڕهێنی تێدایە، تەنانەت تەنها یەك سوورەتی، دەریای مەزنی هەموو قورئانی لەخۆ گرتووە، کە ئەویش جێی ئەم گەردوونەی تێدا بووەتەوە و.. تەنها یەك ئایەتیش گەنجینەی ئەو سوورەتەی لە ئامێز گرتووە و.. زۆربەی ئایەتەکانیش هەریەکەیان وەك سوورەتێکی بچووك و.. زۆربەی سوورەتەکانیش هەریەکەیان وەك قورئانێکی بچووك وان..

جا لەم "ئیجاز"ە خاوەن ئیعجازەوە نەرمونیانییەکی یەکجار مەزن و ئاسانییەکی جوان و فراوان بۆ "ڕێنمایی و ئیرشاد" سەر هەڵدەدات، چونکە هەرچەند هەموو مرۆڤێك لە هەموو کاتێکدا پێویستی بە خوێندنی قورئانە، کەچی هەموو کاتێك چ لەبەر کەودەنی، یان کەم تێگەیشتن، یان لەبەر هەر هۆکارێکی تر، ئەمەی بۆ ناڕەخسێت. جا لەبەر ئەوەی کە هیچ کەسێك لە گشت قورئان مەحرووم نەبێت، ئەوا هەموو سوورەتێکی قورئان لە حوکمی قورئانێکی بچووکدایە، بگرە هەموو ئایەتێکی درێژی قورئان لە شوێنی سوورەتێکی بچووکدایە. تەنانەت هەموو ئەهلی کەشف لەوەدا یەکیان گرتووە کە "قورئان" لە سوورەی "فاتیحە"دا و فاتیحەش لە ﴿**بسم الله الرحمن الرحيم**﴾دا جەم بووە! بەڵگەش لەسەر ئەمە: یەکدەنگیی زانایانی ئەهلی تەحقیقە.

*ڕووناکیی دووەم:*

ئایەتەکانی قورئان بە: "دەلالەت و ئاماژە"کانیان، گەلێ جۆری گوفتار و، زانستی ڕاستەقینە و، پێداویستیی مرۆڤیان تێدا جەم بووە، وەك ئەمر و نەهی.. وەعد و وەعید.. تەرغیب و تەرهیب.. سەرزەنشت و ڕێنمایی.. چیرۆك و نموونەهێنانەوە.. ئەحکام و زانستە خواییەکان.. زانستە گەردوونییەکان و یاسا و مەرجەکانی ژیانی: کەسی و کۆمەڵایەتی و قەلبی و مەعنەوی و قیامەتی. بە ڕادەیەك کە ئەو پەندە باوەی نێوان ئەهلی حەقیقەتی تێدا دێتەدی کە دەڵێت: "خُذْ ما شِئْتَ لِمَا شِئْتَ". بەو واتایەی: ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز هێندە جامیعییەتیان تێدایە کە دەکرێت دەرمانی هەموو دەردێك و خواست و خۆراکی هەموو پێویستییەکیان تێدا بێت..

بەڵێ، دەبێ وابێت، چونکە ئەو قورئانە مەزنەی کە پێشڕەوێکی کامڵ و موتڵەقی گشت چینەکانی ئەهلی کەماڵە، لەوانەی کە هەمیشە پلەکانی بەرزبوونەوە و کەماڵ دەبڕن، دەبێ خاوەنی ئەم تایبەتکارییە دەراسا و ناوازەیە بێت!

*ڕووناكیی سێهەم:*

كه‌ بریتی‌یه‌ له‌ "ئیجاز"ی خاوه‌ن ئیعجازی قورئان. ئـه‌وه‌تا قورئـان هـه‌ندێ جـار سـه‌ره‌تا و كۆتایی زنجیره‌یه‌ك هێنده‌ به‌ ناسـك و نیـانی بـاس ده‌كـات كـه‌ هـه‌موو زنجیره‌كـه‌ی تێـدا پیشـان ده‌دات. هـه‌ندێ جـاری تریـش لـه‌ناو یـه‌ك وشـه‌دا به‌ڵگـه‌ زۆره‌كـانی ده‌عـوایه‌ك، چ بـه‌ ڕاشكاوی و چ به‌ ئاماژه‌ و چ به‌ ڕه‌مز و هێما، ڕیز ده‌كات.

○ بۆ نموونه‌:

﴿وَمِنْ آياتِهِ خَلْقُ السَّموات والأَرْضِ واختِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوانِكُمْ﴾ (الروم:٢٢).

ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌ باسـی سـه‌ره‌تا و كۆتـایی به‌دیـهاتنی گـه‌ردوون ده‌كـات، كـه‌ زنجیره‌ی نیشـانه‌ و به‌ڵگه‌كانی ته‌وحیده‌، ئنجا دوای ئه‌وه‌ زنجیره‌ی دووهه‌م ڕوون ده‌كاته‌وه‌. به‌مـه‌ش وا له‌ خوێنه‌ر ده‌كات كه‌ هه‌ر بۆ خۆی و به‌م جۆره‌ی خواره‌وه‌ زنجیره‌ی یه‌كه‌م بخوێنێته‌وه‌:

یه‌كـه‌م لاپـه‌ڕه‌كانی جیـهان كـه‌ شـایه‌تن له‌سـه‌ر كردگـاری دانـا بریتـین لـه‌: به‌دیـهێنانی ئاسمانه‌كان و زه‌وی و، پاشان ڕازاندنه‌وه‌ی ئاسمانه‌كان بـه‌ ئه‌ستێره‌كان و ئـاوه‌دان كردنـه‌وه‌ی زه‌ویش به‌ زینده‌وه‌ران و، ئنجا گۆڕینی وه‌رزه‌كـان لـه‌ ڕێـی بـه‌كارهێنان و ڕامكردنـی خـۆر و مانگ و، پاشان زنجـیره‌ی كاروبـاره‌ خوایی‌یـه‌كانی له‌مـه‌ڕ جیـاوازی و بـه‌دوای یـه‌كدا هـاتنی شـه‌و و ڕۆژ و.. هـه‌روا به‌م جـۆره‌ تـا ده‌گاتـه‌: تایبه‌تمـه‌ندی و جیـاوازیی هه‌ریـه‌ك لـه‌ زمـان و ده‌نـگ و ڕوخساره‌كان، كه‌ زۆربه‌ی شوێنه‌كانی بڵاوبوونه‌وه‌ی "زۆری"(كثرة)ن..

جـا ئه‌گه‌ر له‌م شـوێنانه‌ی كـه‌ لـه‌ چـاو هـه‌موو شـوێنه‌كانی تـردا پـتر لـه‌ ڕێكوپێكی‌یـه‌وه‌ دوورن و به‌ ڕواڵه‌ت زیاتر ده‌ستی ڕێكه‌وتیان لـێ گیر ده‌بێت، كه‌ ڕه‌نگ و ڕوخساری مرۆڤه‌، ڕێكوپێكی‌یه‌كی ناوازه‌ و دانایانه‌ی ئـه‌وتۆ هـه‌بێت كـه‌ مرۆڤـی ژێـر سه‌رسام بكـات و، كـار و جێ‌ده‌ستی وه‌ستایه‌كی خاوه‌ن حیكمه‌ت به‌و جۆره‌ ده‌ربكه‌وێت.. ئه‌وا ده‌بێ لاپـه‌ڕه‌كانی تـر، كه‌ بـه‌ ئاشـكرا ڕێكوپێكی‌یـان پێـوه‌ دیـاره‌، به‌ڵگه‌یـه‌كی گه‌لـێ ڕوون و ئاشـكراتر بن له‌سـه‌ر نه‌خشه‌كێشی ناوازه‌ی خۆیان!

پاشان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئاسه‌واری "داهێنان" و "دانـایی" لـه‌ خـودی به‌دیـهێنانی ئاسمانـه‌كان و زه‌وی‌دا ده‌بینرێت كـه‌ به‌دیهێنـه‌ری دانـا كردوونـی بـه‌ بـه‌ردی بناغـه‌ی گـه‌ردوون، ئـه‌وا ده‌بێ نه‌خشـی "دانـایی" و ئاسـه‌واری "داهێنـان" لـه‌ به‌شـه‌كانی تـری گـه‌ردووندا گه‌لـێ ئاشـكرا و له‌به‌رچاوتر بێت.

كه‌واته‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ "ئیجاز"ێكـی ناسـكی خـاوه‌ن ئیعجـازی تێـدا بـوو لـه‌: ده‌رخسـتنی شـتی په‌نهان و، په‌نهان كردنی شتی ئاشـكرادا، به‌مـه‌ش ئامـانج و مه‌به‌سـته‌كانی خـۆی بـه‌ كورتـی و پوختی به‌ ده‌سته‌وه‌ دا!

بەڵێ ڕاستە، زنجیرەی ئەو بەڵگانەی کە بە: ﴿فَسُبْحانَ الله حِينَ تُمْسُونَ...﴾ دەست پێ دەکات تا دەگاتە: ﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الأَعْلى فِي السَّموات والأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ و کە شەش جار "ومن آياته... ومن آياته"ی تێدا دووپات بووەتەوە، لە ڕاستیدا: زنجیرەیەکی گەوهەرن.. زنجیرەیەکی نوورن.. زنجیرەیەکی ئیعجازن.. زنجیرەیەکی ئیجازی ئیعجاز بەخشن. پڕ بە دڵ حەزم دەکرد گەوهەرەکانی ئەم گەنجینانەم ڕوون بکردنایەتەوە، بەڵام چارم چییە؟ ئەم مەقامە درێژە پێدانی وا هەڵناگرێت، بۆیە لێرەدا دەرگای لەسەر ناکەمەوە و، پشت بەخوا بۆ کاتێکی تری هەڵدەگرم.

○ نموونەیەکی تر:

﴿فَأَرْسِلُونِ ۞ يُوسُفُ أَيُّهَا الصِّدِّيقُ﴾ (يوسف:٤٥-٤٦).

لە نێوان وشەی ﴿فَأَرْسِلُونِ﴾ و وشەی ﴿يُوسُفُ﴾دا ئەم دەستەواژەیەی خوارەوە حەشار دراوە:

"إلى يوسفَ، لأستعبرَ منه الرؤيا، فأرسلوه، فذهب الى السجن، وقال:"!

بەو واتایەی کە چەند ڕستەیەکی لەناو تەنها یەك ڕستەدا کورت کردووەتەوە، بێ ئەوەی زیان لە ڕوونی و ئاشکرایی ئایەتەکە بدات، یان هیچ گرێ و ئاڵۆزییەك لە تێگەیشتنیدا دروست بکات!

○ نموونەیەکی تر:

﴿الَّذي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الأَخْضَرِ ناراً﴾(يس:٨٠).

قورئان لە بواری بەرپەرچدانەوەی ئەو مرۆڤە ملنەدەرە سەرسەختەی کە سنگی لە بەدیهێنەر دەرپەڕاندووە و، وتوویەتی: ﴿مَنْ يُحْيِ الْعِظامَ وَهِيَ رَمِيمٌ﴾ (يس:٧٨) وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێ: ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ (يس:٧٩) هەروەها دەشفەرموێ: ئەو کەسەی کە لە درەختی سەوز ئاگرتان بۆ بەرهەم دەهێنێت، دەتوانێت ئێسکی پرتوو کاویش زیندوو بکاتەوە.

ئەم گوفتارە لە چەند لایەکەوە ڕووی لە دەعوای زیندوو کردنەوەیە و بە چەند ڕوویەك دەیچەسپێنێت. چونکە لە زنجیرەی ئەو چاکەکارییانەوە دەست پێ دەکات کە خواوەند بە میهرەبانی و چاکەی خۆی بە مرۆڤی بەخشیون، ئەوەتا هەموو ئەمانەی یاد دەخاتەوە و هەستی دەبزوێنێت، پاشان گوفتارەکەی لێرەدا کورت دەکاتەوە، چونکە هەروەك لە چەند ئایەتێکی تردا درێژەی پێ داوە، لەگەڵ ئەوەشدا درێژەی ئەم گوفتارە حەوالەی "ژیری" دەکات و بەوی دەسپێرێت، واتە:

ئەو كەسەی لە درەخت بەروبووم و ئاگر و، لە گژو گیاش ڕۆزی و دانەوێڵە و، لە گڵیش دەغڵ و دان و ڕووەكی پێ بەخشیون، هەر ئەو زەویشی وەك لانك لێ كردووە بۆتان و ڕۆزییەكانی ئێوەی تێدا جەم كردووە و جیهانیشی بۆ كردوون بە كۆشكێكی ئەوتۆ كە گشت پێداویستییەكانی ژیانتانی تێدا ئامادە كراوە..

جا ئایا دەگونجێت ئەو كەسە پشت گوێتان بخات و وازتان لێ بهێنێت تا لە دەستی دەربچن و لە "عەدەم"دا خۆتانی لێ بشارنەوە؟ نەخێر، هەرگیز ناكرێت ئێوە ئاوا هەڕەمەكی و بەرباد بن و، لەناو گۆڕەكانتاندا بخەون و بحەوێنەوە، بێ ئەوەی زیندوو بكرێنەوە و پرسیاری كردەوەكانتان لێ بكرێت!

پاشان "ئاماژە" بۆ تەنها یەك بەڵگەی ئەو دەعوایە دەكات و، بە هێمای وشەی (الشجر الأخضر) دەفەرموێ:

ئەی ئەو كەسەی ئینكاریی حەشر دەكات! سەیری درەختەكان بكە! ئەو كەسەی كە لە وەرزی بەهاردا چەندەها درەختی لە ژمارەبەدەر زیندوو دەكاتەوە، پاش ئەوەی كە لە زستاندا مردبوون و وەك ئێسكیان لێ هاتبوو.. ئەو كەسەی كە ئەو درەختانە سەوز دەكاتەوە، تەنانەت لە هەموو درەختێكدا سێ نموونەی حەشر لە: گەڵا و گوڵ و بەرەكانیدا پیشان دەدات.. هەرگیز نابێ سنگی ئینكاری لەم خاوەن توانایە دەربپەڕێنرێت و بەدیهێنانی حەشری لێوە بە دوور بزانرێت.

پاشان "ئاماژە" بۆ بەڵگەیەكی تر دەكات و دەفەرموێ:

ئەو كەسەی كە ماددەیەكی سووكەڵە و نوورانیی وەك ئاگری لە درەختێكی چڕ و قورس و تاریك بۆ دەرهێناون، چۆن بەلاتانەوە دوورە ژیانێكی ناسكی وەك ئاگر و هەستێكی وەك نوور بەو ئێسكانە ببەخشێت كە وەك تەختەدار وان؟

پاشان بە "ڕاشكاوی" بەڵگەیەكی تر دەهێنێت و دەفەرموێ:

ئەو كەسەی كە بە "لێكخشاندنی دوو لق"ی دارێك ئاگر لەو چەشنە درەختە بەردەدات كە لای دەشتەكییەكان ناسراوە و، دوو دژە سیفەتی وەك شێ و گەرمی لەو دارەدا كۆ دەكاتەوە و یەكێكیان دەكات بە مایەی سەرهەڵدانی ئەوی تر.. ئەم كارەی، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە هەموو شتێك، تەنانەت توخمە ئەسڵی و شوێنكەوتەكانیشیان، تەنها بە هێزی خواوەند دەجووڵێنەوە و فەرمانەكانی ئەو جێبەجێ دەكەن و، هیچ كامیان بە سەربەخۆیی و هەڕەمەكی كار ناكەن..

جا بەدیهێنەری مەزنی ئاوا، هەرگیز نابێ ئەوەی لێوە بە دوور بزانرێت كە: ئەم مرۆڤە لە گڵەوە زیندوو بكاتەوە، لە كاتێكدا كە هەر خۆی لە گڵ بەدیی هێناوە و كردوویەتیەوە بە گڵ.. بەدیهێنەری ئاوا مەزن نابێ بە "مل بۆنەدان" و "سەرسەختی" تەحەددا بكرێت!

پاشان بە وشەی (الشجر الأخضر) درەختە بەناوبانگەكەی حەزرەتی مووسا یاد دەخاتەوە و، هێمایەكی ناسك بۆ یەكگرتنی گشت پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت -

دەکات. وەك بڵێی دەعوای ئەم پێغەمبەرە ﷺ هەمان دەعواکەی حەزرەتی مووسایە - علیه السلام - کە ئەمەش جوانی و نیانی‌یەکی تر دەهاوێتە سەر جوانیی ئیجازی ئەم وشەیە.

*ڕووناکیی چوارەم:*

"ئیجاز"ی قورئان جامیعییەت و ئیعجازی تێدایە، خۆ ئەگەر بە وردی سەیر بکرێت ئەوا بە ڕوونی دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز لە ناوەندی نموونەیەکی جوزئی و ڕووداوێکی تایبەتی‌دا، گەلێ دەستووری فراوانی کوللی و یاسای دوور و درێژی گشتی دەردەخات، وەك‌بڵێیت لە یەك لەوێچ ئاودا دەریایەکی فراوان پیشان بدات!

لە نێوان هەزاران نموونەی ئەمەدا ئاماژە بۆ تەنها دوو نموونە دەکەین:

❍ نموونەی یەکەم:

ئەم نموونەیە بریتی‌یە لەو سێ ئایەتەی کە لە مەقامی یەکەمی وتەی بیستەمدا بە درێژی لێیان دواین و، بە کورتی بەم جۆرەیە:

بە فێرکردنی حەزرەتی ئادەم و شارەزاکردنی لە هەموو ناوەکان، ئایەتەکە فێربوونی سەرجەم هونەر و زانستەکانیش دەگەیەنێت کە ئیلهامی ئادەمیزاد کراون..

هەروەها بە ڕووداوی سوژدەبردنی مەلائیکەتان و سوژدەنەبردنی شەیتان بۆ حەزرەتی ئادەم - درورودی لەسەر بێت - ئایەتەکە دەری دەخات کە: زۆربەی بوونەوەران هەر لە ماسیی دەریاکانەوە تا دەگاتە مەلائیکەتان، هەموویان ئامادە و ڕام کراون بۆ سوودگەیاندن بە نەوەی ئادەم، هەروەك بەدیهاتووە زیانبەخشەکانیش، هەر لە "مار"ەوە تا دەگاتە "شەیتان" ملی بۆ نادەن، تەنانەت دوژمنایەتیشی دەکەن..

هەروەها بە ڕووداوی سەربڕینی مانگاکە لە لایەن قەومی حەزرەتی مووساوە، ئایەتەکە دەری دەبڕێت کە چەمکی "گاپەرستی" بە چەقۆکەی حەزرەتی مووسا - درورودی لەسەر بێت - سەربڕرا، کە بیر و بۆچوونێك بوو لەو ڕۆژگارانەی میسردا برەوی پێ دەدرا، بە ڕادەیەك کە ڕۆڵی ڕاستەوخۆشی لە ڕووداوی بەناوبانگی "گوێرەکە"کەدا هەبووە.

هەروەها بە هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان بەردەکان و لەت بوونی ئەو بەردانە و تەقینەوەی ئاو لە نێوانیانەوە، ئایەتەکە دەری دەخات کە: ئەو چینە بەردینەی لە ژێر "گڵ"دان، چەند گەنجینە و عەمباراوێکن ئاوی مایەی ژیان بە "گڵ"ی ڕووی زەوی دەبەخشن.

❍ نموونەی دووهەم:

گەلێ جار چیرۆکی حەزرەتی مووسا - درورودی لەسەر بێت - لە قورئانی پیرۆزدا دووپات بووەتەوە، چونکە هەموو ڕستەیەکی ئەم چیرۆکە تەنانەت هەموو یەکێك لە بەشەکانی، چمکی دەستوورێکی کوللی دەردەخات و ئەو دەستوورە دەردەبڕێت..

یەکێك لەوانە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێ:

﴿يا هامانُ ابْنِ لِي صَرْحاً﴾ (غافر:٣٦).

فیرعه‌ون فه‌رمان به‌ وه‌زیره‌كه‌ی ده‌دات كه‌: بورجێكی بڵندم بۆ بنیات بنێ تاكو سه‌یری بارودۆخی ئاسمانه‌كان بكه‌م و به‌ چاوی خۆم ببینم كه‌ ئایا خوایه‌كی تێدا هه‌یه‌ كاروباریان به‌ڕێوه‌ ببات، وه‌ك ئه‌وه‌ی مووسا ئیددیعای ده‌كات؟!

ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌ به‌ وشه‌ی: ﴿صَرْحاً﴾ و به‌ ڕووداوێكی جوزئی: ده‌ستوورێكی سه‌یر و نه‌ریتێكی نامۆ پێش‌چاو ده‌خات كه‌ له‌ ناو بنه‌ماڵه‌ی فیرعه‌ونه‌كانی میسردا باو بووه‌. ئه‌وه‌بوو فیرعه‌ونه‌كانی میسر له‌به‌ر ئینكاری كردنی بوونی به‌دیهێنه‌ر و باوه‌ڕبوونیان به‌ سروشت، لافی په‌روه‌ردگارێتی‌یان لێ ده‌دا و، به‌ سته‌م و زه‌بروزه‌نگیش ناوی خۆیان به‌ تۆماركراوی هێشته‌وه‌ و، ئه‌و "هه‌ره‌م"ه‌ به‌ناوبانگانه‌یان بنیات نا كه‌ ده‌ڵێی چیان له‌ ناوه‌ندی ده‌شتایی‌یه‌كی بێ شاخ و چیادا! تاكو به‌م كاره‌یانه‌وه‌ ناوبانگ ده‌ربكه‌ن و ناویان بمێنێته‌وه‌. جگه‌ له‌مه‌ش له‌به‌ر باوه‌ڕ بوونیان به‌: "تناسخ الارواح" و سیحربازی، ته‌رمه‌كانی خۆیان له‌ شێوه‌ی مۆمیادا پاراستووه‌ و، له‌و گۆڕستانه‌ بڵندانه‌دا دایان ناون!

یه‌كێكی تر له‌وانه‌ ئه‌م ئایه‌ته‌یه‌: ﴿فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ﴾ (يونس:٩٢).

ڕووی گوفتار لێره‌دا له‌و فیرعه‌ونه‌یه‌ كه‌ له‌ناو ده‌ریادا خنكا. له‌ هه‌مان كاتدا ئه‌و ده‌ستووره‌ پڕ له‌ په‌ند و ئامۆژگاری‌یه‌ی ژیانی فیرعه‌ونه‌كانیش ده‌رده‌خات كه‌ مردن یادی مرۆڤ ده‌خاته‌وه‌ و، بریتی‌بووه‌ له‌وه‌ی كه‌: له‌به‌ر باوه‌ڕ بوونیان به‌ "تناسخ الارواح": جه‌سته‌ی مردووه‌كانیان به‌ "مۆمیاكراوی" له‌ پێشینانه‌وه‌ بۆ نه‌وه‌كانی داهاتوویان گواستووه‌ته‌وه‌، تاكو ته‌رمی فیرعه‌ونه‌كانیان پیشانی ئه‌وانیش بدرێن. هه‌روه‌ك ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌، به‌ شێوازێكی ئیعجازبه‌خش، ئاماژه‌یه‌كی غه‌یبیش ده‌كات بۆ ئه‌وه‌ی كه‌: ئه‌و ته‌رمه‌ی له‌م چه‌رخه‌ی دواییدا دۆزرایه‌وه‌، ته‌رمی خودی ئه‌و فیرعه‌ونه‌یه‌ كه‌ له‌ ده‌ریادا خنكا. جا هه‌روه‌ك ئه‌و ته‌رمه‌ له‌و شوێنه‌ی تیای‌دا خنكا فڕێ درایه‌ كه‌ناری ده‌ریا، به‌ هه‌مان جۆر له‌ ده‌ریای "زه‌مان"ه‌وه‌ و به‌سه‌ر شه‌پۆلی سه‌رده‌مه‌كاندا فڕێ درایه‌ سه‌ر كه‌ناری ئه‌م سه‌رده‌مه‌ی خۆشمان!

یه‌كێكی تر له‌وانه‌ ئه‌م ئایه‌ته‌یه‌:

﴿يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِساءَكُمْ﴾ (البقرة:٤٩).

ئه‌م ئایه‌ته‌ به‌ ڕووداوی سه‌ربڕینی نێرینه‌ی نه‌وه‌ی ئیسرائیل و هێشتنه‌وه‌ی ئافره‌تان و كچانیان له‌ سه‌رده‌می فیرعه‌وندا، ئه‌و قه‌ڵاچۆكردنه‌ به‌كۆمه‌ڵه‌ ده‌رده‌خات كه‌ له‌ زۆربه‌ی وڵاتان و له‌ هه‌موو سه‌رده‌مێكدا جووله‌كه‌كان گرفتاری ده‌بن، هه‌روه‌ها ئه‌و ڕۆڵه‌ گرنگه‌ش ده‌خاته‌ ڕوو كه‌ ئافره‌تانیان له‌ ژیانی هه‌رزه‌یی گرۆی ئاده‌میزاد و تێكچوونی خووڕه‌وشتی مرۆڤدا، ده‌یبینن!

هه‌ر له‌و ئایه‌تانه‌:

﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ على حَيَاةٍ﴾ (البقرة:٩٦).

﴿وَتَرى كَثيراً مِنْهُمْ يُسارِعُونَ فِي الإِثْمِ وَالْعُدْوانِ وَأَكْلِهِمُ السُّحْتَ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (المائدة:٦٢).

﴿وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَساداً وَاللهُ لا يُحِبُّ الْمُفْسِدينَ﴾ (المائدة:٦٤).

﴿وَقَضَيْنَا إِلى بَنِي إِسْرائيلَ فِي الْكِتابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الأَرْضِ مرَّتينِ﴾ (الإسراء:٤).

﴿وَلا تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدينَ﴾ (البقرة:٦٠).

ئەم دوو حوكمەی كە ئەم ئایەتانە دەرحەق بە جوولەكە دەریان كردووە، واتە هەڵپەكاری و خراپكاری(الحرص والفساد)، لە ڕاستیدا دوو دەستووری گشتی و گرنگیان لەخۆ گرتووە كە ئەو جوولەكانە بە فڕوفێڵ و ساختەكاری لە ژیانی كۆمەڵگای ئادەمیزاددا گرتوویانەتە ئەستۆ، چونكە ئەم ئایەتانە دەری دەخەن كە:

هەر جوولەكەكان بوون لەرزەیان بە ژیانی كۆمەڵایەتیی مرۆڤ خست و، بە: هاندانی كرێكارەكان لە دژی سەرمایەداران، جەنگیان لە نێوان دەوڵەمەندان و هەژاراندا نایەوە و.. هەر ئەوانیش هۆكاری دامەزراندنی بانكەكان بوون و ڕێژەی سوود و ڕیبایان چەند بارە بەرز كردەوە و، بە هەموو هۆكارێكی نزم و بە گشت فڕوفێڵێك سەروەت و سامانی زۆریان بەیەكەوە نا.. هەر خودی ئەوان بوون كە ڕۆشتنە ناو هەموو جۆرە ڕێكخراوە خراپكارەكان و.. دەستیشیان لە نانەوەی هەموو جۆرە ئاشووب و شۆڕشێكدا هەبوو، تاكو تۆڵەی خۆیان لەو گەل و حكوومەتە زاڵ و دەست ڕۆشتووانە بسێننەوە، كە پێشتر مەحروومی و سزایان لەسەر دەست چەشتبوون!

یەكێكی تر لەوانە ئەم ئایەتەیە:

﴿فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِنْ كُنْتُمْ صادِقينَ ۞ وَلَنْ يَتَمَنَّوْهُ أَبَداً﴾ (البقرة:٩٤-٩٥).

ئەم ئایەتە لە ژێر ناونیشانی ڕووداوێكی جوزئی كە لە كۆڕێكی بچووكی خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ڕووی دا، دەری دەخات كە: جوولەكە لە هەموو كەس زیاتر دەست لە داوێنی ژیان - هەر ژیانێك بێت - گیر دەكەن و، لە هەموو خەڵكیش زیاتر لە مردن دەترسن و، هەرگیز ئاواتی مردن ناخوازن و، تا ڕۆژی قیامەتیش دەست لە هەڵپەكردن هەڵناگرن بۆ ژیان!

یەكێكی تر لەوانە ئەم ئایەتەیە:

﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ﴾ (البقرة:٦١).

ئەم ئایەتە لە ژێر ئەم ناونیشانەدا و بە شێوەیەكی گشتی چارەنووسی ڕۆژانی ئایندەی جوولەكەكان ڕوون دەكاتەوە. جا لەبەر ئەوەی "هەڵپەكردن بۆ دنیا" و "خراپكاری" بە قووڵی لە ناخی ڕەوشتیاندا ڕۆچووە و تێكەڵی سروشتیان بووە، ئەوا قورئانی پیرۆز لەم

گوفتاره‌دا زبری و توندوتیژی‌یـان لـه ڕوودا ده‌نوێنێـت و، بۆ مه‌به‌ستی تـه‌مێ كردنیان زلـله‌ی سه‌رزه‌نشت لـه سه‌روگوێلاكیان ده‌سره‌وێنێت!

ده‌توانیت بۆ خۆت لـه به‌ر ڕۆشنایی ئه‌م نموونانـه‌(١): چیرۆكی حـه‌زره‌تی مووسـا، درووده‌ی له‌سه‌ر بێت و، به‌سه‌رهات و ڕووداوه‌كانی تری نه‌وه‌ی ئیسرائیل، لێك بده‌یته‌وه.

پاشان:

گه‌لێ بریسكه‌ی "ئیعجاز"ی وه‌ك ئه‌م نموونانه‌ی ڕووناكیی چواره‌م، به وێنه‌ی "بریسكه‌ی ئیجـازێكی ئیعجازبـه‌خش" لـه پشـت پـه‌رده‌ی وشـه سـاكار و بـاس و بابه‌تـه جوزئی‌یـه‌كانی قورئانه‌وه هه‌ن. خۆ مرۆڤی وریا و تێگه‌یشتووش "ئاماژه"یه‌كی سه‌روزیاده!

*ڕووناكیی پێنجه‌م:*

جامیعییه‌تی ده‌راسـای: "ئامـانج و بابـه‌ت و واتـا و شـێواز و ناسكی و لایه‌نـه جوانـه‌كانی قورئان".

به‌ڵێ، گه‌ر به وردی سـه‌یری سـووره‌ت و ئایه‌تـه‌كانی قورئـانی پیرۆز بكرێـت، بـه تایبـه‌ت سه‌ره‌تای سووره‌ت و ئایه‌ت و بڕگه‌كانی، ده‌رده‌كه‌وێت كه:

قورئانی خاوه‌ن ئیعجازی "به‌یان": هـه‌موو جۆره‌كـانی ڕه‌وانبێـژی و.. گشـت به‌شـه‌كانی گوفتـاری بـه‌نرخ و.. هـــه‌موو چه‌شـــنه‌كانی شـێوازی بـه‌رز و.. یـه‌ك بـه یـه‌كی ڕه‌وشـــته جوانـــه‌كان و.. پوختـــه‌ی گشـــت زانســـته گه‌ردوونی‌یـــه‌كان و.. پێڕســـتی ســـه‌رجه‌م خواناســـی‌یه‌كان و.. گشـــت ده‌ستووره سـوود به‌خشـه‌كانی ژیـانی خۆیـی و كۆمه‌ڵایـه‌تیی مـرۆڤ و.. سـه‌رجه‌م یاسـا بـه‌رز و نوورانی‌یه‌كانی حیكمـه‌تی گـه‌ردوونی، لـه خـۆدا جـه‌م كردووه. وێڕای كۆكردنه‌وه‌ی هـه‌موو ئه‌مانـه‌ش لـه خـۆی‌دا، كـه‌چی هیـچ ئاسـه‌وارێكی لـێ تێكه‌ڵ بوون و نارێكی نه به داڕشتن و نه به واتاكانیه‌وه ده‌رناكه‌وێت!

به‌ڵێ ڕاسته، كۆكردنه‌وه‌ی ئه‌م هه‌موو ڕه‌گه‌زه زۆر و جۆراوجۆرانـه لـه یـه‌ك شـوێندا، بـێ ئه‌وه‌ی هیـچ تێكـه‌ڵی و لـێ‌تێكچوونێكی لـێ دروسـت ببێـت، یـان شـیرازه‌ی هیـچ ڕێسـایه‌ك بپچڕێت و تێكبچێت، بـێ هیـچ گـومانێك ئـه‌م كـاره ته‌نـها هـی ڕێســـای ئیعجـازێكی زاڵـی به‌توانا و خاوه‌ن ده‌سته‌ڵاته.

هـه‌روه‌ها دڕینـی پـه‌رده‌ی شتانی لـه‌گـه‌ڵ ڕاهـاتووی ئاسـایی - كـه سـه‌رچاوه‌ی جـه‌هلی موره‌ككه‌بن - به چه‌ند ڕوونكردنه‌وه‌یه‌كی ئه‌وتۆ كـه ئـه‌و په‌ردانـه كونـاوده‌ر ده‌كـه‌ن، پاشـان ده‌رخستن و پیشاندانی كاره ده‌راسـا و حه‌شـاردراوه‌كانی پشتی ئه‌و په‌رده‌یه بـه ڕوونـی و.. شكاندنی بتی سروشت - كه سه‌رچاوه‌ی گومڕایی‌یه - به شمشێری ئه‌ڵماسیی به‌ڵگه‌كان و.. ڕه‌واندنـه‌وه‌ی پـه‌رده چڕوپڕه‌كـانی خـه‌وی "بێ ئاگـایی" بـه چـه‌ند ده‌نـگ و هـاوارێكی وه‌ك نه‌عره‌تـه‌ی هـه‌ور و.. كردنـه‌وه‌ی نـهێنیی داخـراوی گـه‌ردوون و حـه‌ل كردنی مه‌تـه‌ڵی

سەرسوورهێنی جیهان، کە فەلسەفە و حیکمەتی گرۆی مرۆڤیان تێدا دەستەوسان ماوە.. ئەم کارە تەنها هی ئەم قورئانە خاوەن ئیعجازی بەیان و، حەقیقەتبین و، شارەزای غەیب و، هیدایەتبەخش و، پیشاندەری حەقیقەتەیە!

بەڵێ، گەر بە وردی و بە چاوی ویژدان سەیری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بکرێت، دەبینرێت کە وەك کتێبەکانی تر لە زنجیرە بیرێکی تەدریجی ناچێت کە شوێن ئامانجێك یان دوو ئامانج کەوتبێت، بەڵکو دەبینرێت ئەم ئایەتانە بە شێوەی ئاراستە کردن و بەسەردا خوێندنەوە و بە جۆرێکی کتوپڕی و پەیتاپەیتا، دێت و ئاراستە دەکرێت و، نیشانەی ئەوەی پێوەیە کە هەر کۆمەڵە ئایەتێکی پێکەوە هاتوو بە سەربەخۆیی و پوختی هاتوون و، گشت ئایەتەکانی قورئان بە جۆرێکی پچڕپچڕ و کەم کەم و، لە شوێنێکی دوورەوە و، لە ناوەندی بروسکە و تەلگرافێکی لەوپەڕی جیددی و گرنگی‌دا، نازڵ بوون.

بەڵێ، جگە لە بەدیهێنەری بوونەوەران کێ دەتوانێت ئەم گوفتارە بەم شێوە جیددی‌یە دابڕێژێت، کە گوفتارێکە پەیوەندی‌یەکی بەتینی بە گەردوون و بەدیهێنەری گەردوونەوە هەیە؟ یان کێ هەیە جگە لەو بتوانێت لەڕادەبەدەر سنووری خۆی بشکێنێت و بە ئارەزووی خۆی بچێت بە ناوی بەدیهێنەری شکۆمەند و بە ناوی گەردوونەوە گوفتارێکی ئاوا ڕاست و ڕەوای لە زار دەربچێت؟!

بەڵێ، قورئان بە ئاشکرا پێوەی دیارە کە: فەرمایشتی بەدیهێنەری بوونەوەرانە و، گوفتارێکی حەق و جیددی و بەرز و بێ گەردی ڕاستەقینەیە و، هیچ نیشانەیەکی لاسایی کردنەوەی پێوە دیار نی‌یە.

خۆ ئەگەر بە گریمانی مەحاڵیش کەسێکی وەك موسەیلەمەی درۆزن هەبێت لەڕادەبەدەر سنووری خۆی شکاندبێت و، لاسایی گوفتاری بەدیهێنەری خاوەن عیزەت و جەبەرووتی خۆی بکاتەوە و، لە زادەی بیری خۆیەوە بە ناوی گەردوونەوە بدوێت، ئەوا بێ گومان هەزاران نیشانەی لاسایی و تەصەنوع و غەش و ساختە و فێڵ و تەکەللوفی پێوە دەردەکەوێت، چونکە هەر کەس خۆی لە پلە و بارودۆخێکی گەلێ بەرزتردا لەچاو حاڵی پەست و نزمی خۆی دەربخات، ئەوا بێ گومان هەموو ڕەفتارێکی تەصەنوع و لاسایی کردنەوەی پێوە دەردەکەوێت!

بە وردی سەیری ئەم ڕاستی‌یە بکە کە ئەم سوێندەی خوارەوە ڕایدەگەیەنێت:

﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى ۞ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى ۞ وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى ۞ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم: ١-٤).

# تیشكی سێهه‌م

## ئیعجازی قورئانی پیرۆز له‌مه‌ڕ:

هه‌واڵدانی له‌ شتانی غه‌یبی و به‌رده‌وامیی لاوی‌یه‌كه‌ی و ئاراسته‌ كردنی گوفتاری بۆ هه‌موو چینه‌كانی مرۆڤ

**ئه‌م تیشكه‌ سێ "جیلوه‌"ی په‌خشاندووه‌**

## جیلوه‌ی یه‌كه‌م

### هه‌واڵدانی قورئان له‌ شتانی غه‌یبی

ئه‌م جیلوه‌یه‌ش سێ "شه‌وق"ی داوه‌ته‌وه‌

❏ **شه‌وقی یه‌كه‌م:**

**هه‌واڵدانی قورئان له‌ "غه‌یبی ڕابوردوو".**

ئه‌م قورئانه‌ حه‌كیمه‌ له‌سه‌ر زمانی پێغه‌مبه‌رێك، كه‌ به‌ یه‌كده‌نگیی هه‌موان نه‌خوێنده‌وار و ئه‌مین بووه‌، گه‌لێ ڕووداو ده‌گێڕێته‌وه‌، هه‌ر له‌ ڕووداوه‌كانی سه‌رده‌می ئاده‌مه‌وه‌ - دروودی له‌سه‌ر بێت - تا سه‌رده‌می نازڵبوونی، كه‌ باشترین سه‌ده‌ و سه‌رده‌م بووه‌. هه‌روه‌ها به‌وپه‌ڕی هێز و جیددی‌یه‌ته‌وه‌: گرنگترینی حاڵه‌ت و به‌سه‌رهاته‌كانی پێغه‌مبه‌ران - درووديان له‌سه‌ر بێت - باس ده‌كات و، له‌مه‌شدا كتێبه‌ پێشووه‌كانی وه‌ك ته‌ورات و ئینجیل پشتی ده‌گرن و ته‌سدیقی ده‌كه‌ن و، قورئان له‌و شتانه‌دا كه‌ وه‌ك كتێبه‌كانی پێشوو وایه‌ پشتیان ده‌گرێت و، له‌و باس و بابه‌تانه‌شدا كه‌ له‌وان ناچێت و مایه‌ی ئیختیلافی نێوانیانه‌، حه‌قیقه‌تی ڕووداوه‌كانیان بۆ ڕاست ده‌كاته‌وه‌!

به‌و واتایه‌ی كه‌ "ڕوانینی غه‌یب بینی قورئان" ڕووداوه‌كانی ڕابوردوو باشتر ده‌بینێت له‌ چاو ئه‌و كتێبانه‌، به‌ چه‌شنێك كه‌ له‌و بابه‌تانه‌ی قسه‌ی هه‌موویانی تێدا یه‌كانگیر بووه‌، ته‌سدیق و ته‌زكیه‌ی ئه‌وان ده‌كات و، له‌و باس و بابه‌تانه‌شدا كه‌ ئیختیلافیان له‌ نێواندایه‌، قورئان ڕووداوه‌كانیان بۆ ڕاست ده‌كاته‌وه‌!

ده‌بێ بیشزانین كه‌ حاڵه‌ت و ڕووداوه‌كانی ڕابوردوو كارێكی "عه‌قلی" نین تا به‌ "ژیری" بزانرێن و هه‌واڵیان له‌ باره‌وه‌ بدرێت! به‌ڵكو شتێكی "نه‌قلی"ن و پشت به‌ بیستن و گێڕانه‌وه‌ی ده‌ماوده‌م ده‌به‌ستن، یان به‌ گواستنه‌وه‌ و گێڕانه‌وه‌یان له‌ ڕێی تۆماركردن و نووسینیانه‌وه‌، كه‌ دیاره‌ ئه‌مه‌ش كارێكه‌ تایبه‌ته‌ به‌ كه‌سانی خوێنده‌واره‌وه‌..

بەڵام خۆ دۆستان و دوژمنان قسەیان لەسەر ئەوە یەکی گرتووە کە: قورئان بۆ کەسێك نازڵ بووە کە هیچ شارەزاییەکی لە نووسین و خوێندنەوەدا نەبووە و بە "دەستپاکی" و سیفەتی "نەخوێندەواری" ناسراو بووە. ئنجا بە شێوەیەك لەو حاڵەتانەی ڕابوردووش دەدوێت و هەواڵیان ڕادەگەیەنێت کە دەڵێی هەموویان بە چاو دەبینێت! چونکە گیان و دەماری بزواوی ڕووداوێکی درێژ دەگرێت و لە بارەیەوە دەدوێت و ذەیکات بە پێشەکیی مەبەست و ئامانجەکەی! واتە ئەو کورتە و پوختە هەواڵانەی لە قورئاندا باس کراون، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسەی ئەم هەواڵانەی دەرخستووە، هەموو حاڵەتەکانی ڕابوردوو دەبینێت. ئەوەتا بە وێنەی کەسێك کە لە "هونەر"ێك یان "سنعەت"ێکدا پسپۆر بێت و، پوختەیەکی ئەو هونەرە، یان نموونەیەکی ئەو سنعەتە دروست بکات و پێشچاوی بخات و، ئەم کارەی بکات بە بەڵگە لەسەر سەلیقە و کارامەیی خۆی لەو بوارەدا. بە هەمان جۆر، ئەو پوختە و گیانی ڕووداوانەش کە لە قورئانی پیرۆزدا باس کراون، دەری‌دەخەن کە:

ئەو هەواڵدەرەی دەیانگێڕێتەوە، گشت لایەنەکانی ئەو ڕووداوە ئاگادارە و چاوی لێیەتی، بۆیە وا بە کارامەیی‌یەکی نائاسایی و لەڕادەبەدەر (گەر ئەم تەعبیرە دروست بێت) لێیان دەدوێت و هەواڵیان ڕادەگەیەنێت.

❑ **شەوقی دووهەم:**

**هەواڵدانی قورئان لە "غەیبی داهاتوو".**

ئەم بەشە گەلێ جۆری زۆری هەیە.

یەکەم بەش تایبەتە بە ئەهلی کەشف و ویلایەتەوە.

❍ بۆ نموونە:

"محیدینی کوڕی عەرەبی" گەلێ هەواڵدانی غەیبیی لە سوورەتی "روم": ﴿الٓمٓ ۞ غُلِبَتِ الرُّومُ﴾دا دۆزیوەتەوە..

ئیمامی ڕەببانیش (ئەحمەدی فاروقیی سەرهەندی) - خوا لێی ڕازی بێت - گەلێ ئاماژەی مامەڵە غەیبی‌یەکانی لە پیتە پچڕپچڕەکانی سەرەتای سوورەتەکاندا دیوەتەوە.

خۆ سەبارەت بە زانایانی "باطن"یش، ئەوا قورئانی حەکیم هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، جۆرێکی هەواڵدانە لە غەیب!

بەڵام ئێمە ئاماژە تەنها بۆ بەشێك لەوانە دەکەین کە تایبەتە بە عامەی خەڵکەوە و ڕووی لە هەموانە. ئەم بەشەش گەلێ چینی زۆری تێدایە و، تەنها لە یەك چینیان دەدوێین.

قورئانی پیرۆز بە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ[1]:

---

(١) گەلێ کتێبی تەفسیر هەن ئەم ئایەتانەیان ڕوون کردووەتەوە کە هەواڵیان لە غەیب داوە. بۆیە لێرەشدا ڕوون نەکرانەوە، چونکە نیازی چاپکردنی ئەم کتێبە بە پیتە کۆنەکان(واتە پیتی عەرەبی) دانەری تووشی هەڵەی پەلەکردن کرد. بەو هۆیەوە، ئەو گەنجینە بەنرخانە لێرەدا بە داخراوی مانەوە! (دانەر)

﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللهِ حَقٌّ﴾ (الروم: ٦٠).

﴿لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرامَ إِنْ شاءَ اللهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لا تَخافُونَ﴾(الفتح:٢٧).

﴿هُوَ الَّذي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدى وَدينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلى الدِّينِ كُلِّهِ...﴾ (الفتح:٢٨).

﴿وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ۞ في بِضْعِ سِنِينَ للهِ الأَمْرُ...﴾ (الروم:٣-٤).

﴿فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ ۞ بِأَيِّكُمُ الْمَفْتُونُ﴾ (القلم:٥-٦).

﴿أَمْ يَقُولُونَ شاعِرٌ نَتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ﴾ (الطور: ٣٠).

﴿قُلْ تَرَبَّصُوا فَإِنِّي مَعَكُمْ مِنَ الْمُتَرَبِّصِينَ﴾ (الطور: ٣١).

﴿وَاللهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ (المائده:٦٧).

﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا...﴾ (البقرة:٢٤).

﴿وَلَنْ يَتَمَنَّوْنَهُ أَبَداً﴾ (البقرة:٩٥).

﴿سَنُرِيهِمْ آياتِنا في الآفاقِ وَفي أَنْفُسِهِمْ حَتّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾ (فصلت:٥٣).

﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنْسُ والْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هذا القُرْآنِ لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهيراً﴾ (الإسراء:٨٨).

﴿يَأْتِي اللهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ على الْمُؤْمِنينَ أَعِزَّةٍ على الْكافِرينَ يُجاهِدُونَ في سَبيلِ اللهِ وَلا يَخافُونَ لَوْمَةَ لائِمٍ﴾ (المائدة:٥٤).

﴿وَقُلِ الْحَمْدُ للهِ سَيُرِيكُمْ آياتِه فَتَعْرِفُونَها﴾ (النمل:٩٣).

﴿قُلْ هُوَ الرَّحْمنُ آمَنَّا بِهِ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ في ضَلالٍ مُبينٍ﴾ (الملك:٢٩).

﴿وَعَدَ اللهُ الَّذينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ في الأَرْضِ كَما اسْتَخْلَفَ الَّذينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذي ارْتَضى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً﴾(النور:٥٥).

ئه‌مانه و ئایه‌ته‌كانی تری وه‌ك ئه‌مانه، گه‌لێ زۆرن كه هه‌واڵیان له غه‌یب داوه و، پاشان به‌و جۆره‌ی كه هه‌واڵیان دا هه‌موو ئه‌و ڕووداوانه هاتنه‌دی!

جا هه‌واڵدان له غه‌یب، بێ هیچ دوودڵی‌یه‌ك و.. به كه‌ماڵی جیددی‌یه‌ت و دڵنیایی و.. به جۆرێك كه ده‌ری بخات ئه‌وپه‌ڕی باوه‌ڕی به خۆی هه‌یه و.. له‌سه‌ر زمانی كه‌سێك كه گیرۆده‌ی ڕه‌خنه و ئیعتیرازی ڕه‌خنه‌گران ده‌بێت و، له‌وانه‌یه ته‌نها له‌به‌ر هه‌ڵه‌یه‌كی بچووك سه‌رجه‌می ده‌عواكه‌ی بدۆڕێنێت..

ئه‌م هه‌واڵدانه به‌م جۆره، به‌ڵگه‌یه‌كی گومانبڕه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه: ئه‌و هه‌واڵده‌ره ده‌رسه‌كانی له لای مامۆستای ئه‌زه‌لی ده‌خوێنێت، ئنجا به خه‌ڵكیان ڕاده‌گه‌یه‌نێت!

**❑ شەوقی سێهەم:**

**هەواڵدانی قورئان لە "غەیبی: حەقیقەتە خوایی و گەردوونی و قیامەتی‌یەکان".**

بەڵێ، ئەو ڕوونکردنەوانەی قورئان کە تایبەتن بە حەقیقەتە خوایی‌یەکان و.. ئەوانەشیان کە لە بارەی بوونەوەرانەوەن و گرێ کوێرەی گەردوونیان کردووەتەوە و مەتەڵی بەدیهاتنی جیهانیان حەل کردووە، گرنگترین و گەورەترینی ڕوونکردنەوەکانی قورئانن. چونکە ئەم کارە هەرگیز لە کێشی "عەقڵ"دا نی‌یە و "ژیری"ی مرۆڤ ناتوانێت لە نێوان چەندین ڕێگای چەوتی گومڕایی‌دا ڕێگایەکی ڕاست بگرێتەبەر و ئەو ڕاستی‌یە غەیبی‌یانە بدۆزێتەوە!

خۆ ئاشکرایشە کە گەورە بلیمەتانی دانایانی گرۆی مرۆڤ نەیانتوانیوە لە ڕێی ژیری‌یەوە بە بچووکترین و سادەترینی ئەو ڕاستی‌یانە بگەن!

پاشان بێ هیچ گومانێك خودی ژیری‌یەکانی مرۆڤ لە بەردەم ئەو ڕاستی‌یە ئیلاهی و گەردوونی‌یانەی کە قورئان ئاشکرای کردوون، بەچۆکدا دێن و پێی دەڵێن: "صدقت"!.. خۆ پاش ئەوەی کە بە دڵێکی ساف و دەروونێکی خاوێن گوێیان لە "بەیان"ی قورئان ڕاگرت و دوای بەرزبوونەوەی ڕۆح و کامڵ بوونی "ژیری"یان، سەرجەم ئەو ڕاستی‌یانەی قورئان وەردەگرن و، بە وتنی: "بارك الله" پیرۆزبایی لە قورئانی پیرۆز دەکەن!

جا لەبەر ئەوەی "وتەی یازدەهەم" چەردەیەکی لەم بەشە چەسپاندووە و ڕوونی کردووەتەوە، ئەوا لێرەدا دووپات کردنەوەمان بە پێویست نەزانی.

سەبارەت بە هەواڵدانی قورئانیش لە غەیبی "ئاخیرەت"، ئەوا لەو کاتەدا کە "ژیری"ی مرۆڤ – بە تەنها خۆی – پەی بە هیچ کام لە حاڵەتەکانی ئاخیرەت و بەرزەخ نابات و نایان بینێت، دەبینیت قورئان تا ئەندازەی پلەی "شهوود" ئەو ڕاستی‌یانە دەبینێت و بە بێ گومانی دەیانچەسپێنێت!

فەرموو سەر لە وتەی دەهەم (پەیامی حەشر) بدە، با بۆ خۆت ڕاستیی ئەو هەواڵە غەیبییانەت بۆ دەربکەوێت کە قورئان لە بارەی ئاخیرەتەوە ڕایاندەگەیەنێت. چونکە ئەو پەیامە لە ڕادەبەدەر ئەو هەواڵانەی قورئانیان ڕوون کردووەتەوە.

## جیلوەی دووهەم

## لاوێتیی قورئان

قورئانی پیرۆز هێندە پارێزگاریی گەنجی و لاوێتیی خۆی کردووە کە لە هەموو سەردەمێکدا دەڵێی بە تازەیی و لاوی و پاراوی نازڵ بووە!

بەڵێ، لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز گوفتارێکی ئەزەلی‌یە و ڕاستەوخۆ ئاراستەی مرۆڤی هەموو چینەکانی گشت سەردەمێك کراوە، ئەوا دەبێ خاوەنی "لاوی"یەکی ئاوا بەردەوام

بێت، ئەوەتا بە "لاوی" پەیدا بووە و هەر وەهاش ماوەتەوە. تەنانـەت بـە ڕوانینێکـی وەك بنێـی تایبـەت دەڕوانێتـە هـەموو یـەکێك لـەو سـەردەمانەی کـە سروشـت و بیر و ڕا و بۆچوونیـان جیاوازە و، بەپێی داخوازی‌یەکانی یەك بە یەکیان دەدوێت و، وانەکانی دەڵێتـەوە و، سـەرنجی خەڵکی ئەو ڕۆژگار و سەردەمانەشیان بۆ لا ڕادەکێشێت.

گەر سەیری ئاسەوار و یاساکانی گرۆی مرۆڤ بکەین، دەبینین ئـەوانیش وەك مرۆڤـەکان "پیر" دەبن و ئالوگۆڕیان بەسـەردا دێـت، کـەچی ئـەحکام و یاسـاکانی قورئـان: ڕاگـیر و توندوتـۆڵ و ڕەگداکوتـاون، بـە ڕادەیـەك کـە ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ قـایمی و تۆکمـەیی‌یان پـتر دەردەکەوێت.

بەڵێ، ئەم چەرخ و سەردەمەی ئێمە کە زۆر لە خـۆی بـایی بـووە و زیـاتر لـە چەرخـەکانی پێشین گوێـی لـە بیسـتنی قورئـان ئـاخنیوە، بـە تایبـەت ئـەهلی کیتـابی سـەردەم کـە لـە هـەموو چەرخەکانی ڕابوردوو پتر پێویستیان بە ڕێنمایی ئەو قورئانە هەیە کە بە: ﴿**يا أَهْلَ الْكِتابِ**﴾.. ﴿**يا أَهْلَ الْكِتابِ**﴾.. ڕووی گوفتاریان تێ‌دەکات، تەنانـەت دەڵێـی ئـەم گوفتـارە بـە تایبـەتی و ڕاستەوخۆ ئاراستەی ئەم چەرخەی ئێمە کراوە، چونکە وشەی ﴿**يا أَهْلَ الْكِتابِ**﴾، "يا أهـلَ المكتبِ" واتە "ئەی ئەهلی ڕۆشنبیریی نوێ"ش دەگرێتەوە!

ئـەوەتا قورئـان بـە هـێز و توندوتۆڵیـی خـۆی و، بـە هـەموو تـازەیی و پاراوی‌یـەکی و، بـە دەنگێکی زوڵاڵی هێندە بەرز کە زەوی و ئاسمانەکان پڕ دەکـات و لـە ئاسـۆدا دەزرنگێتـەوە، بانگیان لـێ دەکات و پێیان دەفەرموێ:

﴿**يا أَهْلَ الْكِتابِ تَعَالَوْا إِلى كَلِمَةٍ سَواءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ...**﴾ (آل عمران:٦٤).

بۆ نموونە:

لە کاتێکدا کە دانە دانـە و کۆمەڵـەکانی گـرۆی مـرۆڤ لـە بەرەنگاربوونـەوەی قورئـاندا دەستەوسان مان، کەچی وا لەم سەردەمەدا ئـەم شارسـتانێتی‌یە نوێ‌یـەی ئێسـتا، کـە بەرهـەمی بیروڕا و بۆچوونـی ئـادەمیزاد بـەڵکو گـرۆی جیننی‌شـە، شـێوەی نـەیارێکی قورئـانی لـەخۆ گرتووە و، بە شێوازە ساحیرانە و سەرنج ڕاکێشەکانی دەیەوێت بەرەنگاریی قورئـان بکـات. جا بۆ ئەوەی ئیعجازی قورئان بەپێی دەعوای ئایەتی پیرۆزی: ﴿**قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنْسُ وَالْجِنُّ..**﴾ بۆ ئەم بەرەنگاربووە سامناك و نوێ‌یەش بچەسپێنین، ئەوا ئەو بناغە و دەستوورانەی کە شارستانێتیی نوێ هێناونی، لە بەرامبەر بناغەکانی قورئانی پیرۆزدا ڕادەگرین..

**لە پلـەی یەکـەمدا:** گشـت ئـەو بـەراوردکاری و تەرازووانـە پێش‌چاو دەخـەین کـە لـە وتەکانی پێشوودا هێناومانن، هەر لە وتەی یەکەمەوە تا وتەی بیست و پێنجەم.. هەروەها ئـەو ئایەتە پیرۆزانەش دەخەینە ڕوو کە لە سـەرەتای ئـەو وتانـەدان و حەقیقەتـەکانیان دەردەخـەن..

چونکە هەموو ئەمانە، بە یەقین و دڵنیاییەکی ئەوتۆ کە هەرگیز گومان و دوودڵی توخنیان ناکەوێت، ئیعجاز و سەرکەوتنی قورئانیان بەسەر شارستانێتیی سەردەمدا، چەسپاندووە!

**لە پلەی دووهەمیشدا**: بە پوختی بەشێك لەو دەستوورانەی "شارستانێتی" و "قورئان" دەهێنین کە وتەی دوازدەهەم چەسپاندوونی و ڕوونی کردوونەتەوە:

ئەوەتا فەلسەفەی شارستانێتیی نوێ باوەڕی وایە کە: ستوونی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ بریتییە لە "هێز" و.. لە هەموو شتێکدا "بەرژەوەندی و سوود"ی مەبەستە و.. "مشتومڕ" دەکات بە دەستووری ژیان و.. "ڕەگەز پەرستی" و "قەومییەتی سەلبی" دەکات بە پەیوەندیدەری نێوان کۆمەڵانی مرۆڤ و.. ئامانجیشی "گاڵتەوگەپێکی بەربادی بێ مەبەست و بێ ئامانجە" بۆ تێرکردنی ئەو مەیل و خواست و هەوا و ئارەزووانەی کە پتر ئارەزووی دەروون دەورووژێنن و پەتی پێ دەبچڕن و بەرەڵای دەکەن!

خۆ ئاشکرایشە کە هێز ئەنجامەکەی "لەسنوور دەرچوون" دەبێت و.. سوودیش سروشتی وایە "پاڵپاڵێن"ی لێ پەیدا دەبێت، چونکە بەشی دابین کردنی پێداویستی و ئارەزووەکانی هەموان ناکات و.. مشتومڕیش "ململانێ" و "زۆرانکاری"ی لێ دەبێتەوە و.. ڕەگەزپەرستیش "لەسنوور دەرچوون"ی لێ پەیدا دەبێت، چونکە ڕەگەزایەتییەکە گەشە دەکات و بە هەڵلووشینی ڕەگەزەکانی دی، فراوان دەبێت.

شارستانێتیی نوێ، هەرچەند لایەنی چاکەشی تێدایە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەسەر ئەم بناغانە بنیات نراوە و پاڵی بەم دەستوورانەوە داوە، ئەوا نەیتوانی بەختەوەرییەکی تەنانەت ڕواڵەتیش بە لەسەدا بیستی خەڵکی زیاتر بدات و، هەموو ئەوانی تری گیرۆدەی نیگەرانی و بەدبەختی کرد و بە دەردی سەریی زۆرەوە تلاندنیەوە.

بەڵام حیکمەتی قورئانی پیرۆز لە بریی: هێز، "حەق" دادەنێت بە ستوون و خاڵی پشت پێبەستن لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا و.. لە بریی سوودیش "ڕەزامەندیی خوای گەورە" و "بەدەستهێنانی ڕەفتار و خووی بەرز" دەکات بە ئامانج و.. لە جیاتی مشتومڕیش "یارمەتی و هاوکاری" دەکات بە دەستوور و بناغە لە ژیاندا و.. لە بریی ڕەگەزپەرستی و قەومییەتی سەلبی، دەست بە "ئایین" و پیشە و نیشتمانەوە دەگرێت، تاکو بیانکات بە پەیوەندیدەری کۆمەڵانی مرۆڤ و.. ئنجا سنووردانان بۆ دەستدرێژیی لەسنوور دەرچوونەکانی "دەروون" و، هاندانی "گیان" بۆ ڕۆیشتن و بەرزبوونەوە بەرەو کار و ئاقار و ئامانجە بڵندەکان و.. دڵنیاکردنی هەستە بەرزەکانی گیان، دەکات بە ئامانجی خۆی تاکو مرۆڤ بەرەو کەماڵ و ڕەوشتە بەرزەکان سەربخات و بیکات بە مرۆڤی ڕاستەقینە. خۆ ئاشکرایە کە ئەنجامی "حەق"، یەکگرتنە و، هی "ڕەوشت بەرزی"ش پشتگیریی یەکترە و،

"هاوكاری"ش ئەنجامەكەی فریاكەوتنی یەكتری دەبێت و، "ئایین"یش برایەتی و پشتگیریی یەكتری لێ پەیدا دەبێت و، ئنجا "لەغاوكردنی نەفس و هەڵپەكاریەكانی" هاودەم لەگەڵ "سەربەست كردنی گیان و هاندانی بۆ ڕۆشتن بەرەو كەماڵ" دەبن بەهۆی (بەختەوەریی هەردوو دنیای مرۆڤ)!

بەم جۆرە، شارستانێتیی نوێ سەرباری ئەو لایەنی جوانی و چاكەكاریانەی كە لە ئایینەكانی پێشوو بە تایبەت لە قورئانی پیرۆز وەری گرتوون، كەچی لە بەردەم قورئانی حەكیمدا ڕووخا و شكستی هێنا!

**لە پلەی سێهەمیشدا:** تەنها سێ چوار دانە بناغە - لە نێوان هەزاران مەسەلەدا - بۆ نموونە دەهێنینەوە:

★ *مەسەلەی یەكەم:*

لەبەر ئەوەی یاسا و دەستوورەكانی قورئانی پیرۆز لە "ئەزەل"ەوە هاتوون، ئەوا هەر دەشمێننەوە و بەرەو "ئەبەد" دەڕۆن و، هەرگیز چەشنی یاسا شارستانیەكان تووشی "پیری" و گرفتاری "مردن" نابن، بەڵكو هەمیشە لە هەموو كاتێكدا هەر بەهێزن و بە "لاوێتی" دەمێننەوە!

بۆ نموونە: شارستانێتیی نوێ، بە هەموو كۆمەڵە خێرخوازی و ڕێكخراوە چوست و چالاكەكانی و گشت ڕژێمە بەزەبروزەنگ و دەزگا پەروەردەیی و ڕەوشتیەكانی خۆیەوە، نەیتوانی بەرەنگاریی دوو مەسەلەی قورئانی پیرۆز بكات، بەڵكو لە بەردەم ئەو دوو مەسەلەیەی قورئاندا پەكی كەوت و شكستی هێنا. ئەو دوانەش بریتین لە ئایەتی:

﴿وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ (البقرة:٤٣) و ئایەتی: ﴿وَأَحَلَّ اللهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ (البقرة:٢٧٥).

وا بە "پێشەكی"یەك ئەم سەركەوتنە ئیعجازبەخشەی قورئان ڕوون دەكەینەوە:

وەك لە "إشارات الإعجاز"دا چەسپێنراوە: بناغەی هەموو پشێوی و شۆڕش و ئاشووبێك لە كۆمەڵگای مرۆڤدا تەنها یەك وشەیە، هەروەك سەرچاوەی سەرجەم ڕەوشتە نزمەكانیش تەنها یەك وشەی ترە..

وشەی یەكەم: (گەر من بۆ خۆم تێر بم چیم لە خەڵكی داوە؟ با لە برساندا بمرن)!

وشەی دووهەم: (تۆ كار بكە با من بەری ڕەنجت بخۆم و، ماندوو ببە با من بحەوێمەوە)!

بەڵێ، بە پارێزگاری كردنی هاوسەنگیی نێوان چینی خەواص و عەوام، واتە "دەوڵەمەندان" و "هەژاران" نەبێ، هەرگیز ئاشتی و ژیانی ئاسوودە و تەبایی لە هیچ كۆمەڵێكدا نایەتە دی. بناغەی ئەم هاوسەنگیەش: سۆز و بەزەییهاتنەوەی خەواصە بە چینی عەوامدا و، گوێڕایەڵی و ڕێزنواندنی عەوامیشە بۆ چینی خەواص.

وا ئێستا وشەی یەکەم چینی خەواصی بەرەو خراپکاری و ستەم داوەتە بەر و، وشەی دووهەمیش چینی عەوامی گرفتاری رق و قین و حەسوودی و مشتومڕ کردووە. بەم جۆرە و هەر لە ماوەی چەندین چەرخی پێشترەوە تا دەگاتە ئەم چەرخ و سەردەمەی خۆمان، حەوانەوە و ئاسایش لە گرۆی مرۆڤ سەندراوەتەوە و لێی بێبەش کراوە، ئەوەبوو یەکەم جار، وەك لای هەموان ئاشکرایە، ڕووداوە گەورەکانی مشتومڕی نێوان کرێکاران و سەرمایەداران لە ئەورووپادا سەری هەڵدا.

خۆ شارستانێتیی نوێش، بە هەموو کۆمەڵە خێرخوازی و دەزگا ڕەوشتییەکانی و گشت هۆکارە توند و تیژەکانی سەپاندنی ڕێسا، نەیتوانی ئەو دوو چینەی گرۆی مرۆڤ پێکبهێنێت و تەبایی و ئاشتییان بخاتە نێوانەوە، هەروەك لە تیمار و ساڕێژکردنی دوو برینە قوولەکەی ژیانی مرۆڤایەتیشدا دەستەوسان ما.

بەڵام قورئانی پیرۆز، بە "واجب کردنی زەکات" وشەی یەکەم لە ڕیشەدا دەردەهێنێت و برینەکەی ساڕێژ دەکات.. هەروەك بە "حەرام کردنی ڕیبا" وشەی دووهەمیش لە بناغەدا هەڵدەتەکێنێت و شیفا و ساڕێژیش بە زامەکەی دەبەخشێت.

بەڵێ، ئایەتەکانی قورئان لە دەرگای "جیهان"دا ڕاوەستاون و بە "ڕیبا"(سوو) دەڵێن: "هاتنە ژوورەوە قەدەغەیە"! هەروەها فەرمان بۆ گرۆی مرۆڤیش دەردەکەن کە: (دەرگاکانی ڕیبا لە خۆتان دابخەن، با گشت دەرگاکانی جەنگ و ئاشووبتان لە بەردەمدا دابخرێت)! هەروەك قورئان مەترسییەکانی چوونە ژوورەوە لەو دەرگایەوە بۆ قوتابییە ئیماندارەکانیش ڕوون دەکاتەوە، تاکو خۆیانی لێ بپارێزن.

★ *بناغەی دووهەم:*

شارستانێتیی نوێ "فرەژنی" قبووڵ ناکات و، پێی وایە ئەو حوکمەی قورئان پێچەوانەی "دانست" و "بەرژەوەندی"ی مرۆڤە!

بەڵێ، گەر "حیکمەت" لە ژنهێناندا: "هێنانەدیی خواستی ئارەزوو" بێت، ئەوا دەبوو حوکمەکەی قورئان پێچەوانە بوایە. بەڵام خۆ بە شایەتیی سەرجەم گیانلەبەران و تەسدیقی گشت ڕووەکە نێر و مێ هاوسەرەکان چەسپاوە کە:

حیکمەت و ئامانجی ژنهێنان: "وەچەخستنەوە" و "زیادبوونی ڕەگەز"ە. چێژ و لەزەتی بەرهەمی ئەنجامدانی خواستی ئارەزووش، کرێ و پاداشتێکی جوزئییە کە میهرەبانیی خوای گەورە بەرامبەر بە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە دەیبەخشێت!

جا مادەم ژنهێنان لە ڕووی "دانست" و "حەقیقەتەوە" بۆ: زیادبوونی ڕەگەز و وەچەخستنەوەیە، ئەوا ئەو ئافرەتەی کە لە ماوەی ساڵێکی تەواودا تەنها یەك جار دەتوانێت منداڵی ببێت و، ماوەی پیتاندنیشی لە یەك مانگدا تەنها نیوەی ڕۆژەکانی مانگە و، لە تەمەنی

پەنجا ساڵیشدا لە سك و زا دەكەوێت، هەرگیز سەروزیادی "پیاو" نی‌یە كە لە زۆربەی كاتەكاندا تەنانەت لە تەمەنی سەد ساڵیشدا توانای پیتاندنی هەیە. لەبەر ئەوە، شارستانێتیی نوێ ناچار دەبێت مەڵبەندەكانی داوێن‌پیسی بكاتەوە و شوێنەكانی بەدڕەوشتی دابمەزرێنێت!

★ *بناغەی سێ‌هەم:*

ئەو شارستانێتی‌یەی كە پرس و ڕا بە مەنتیقی "ژیری" ناكات، ڕەخنە لەم ئایەتە پیرۆزە دەگرێت: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾ (النســـاء:١١) كە سێ‌یەكی میرات (واتە نیوەی ئەو ئەندازەیەی نێرینە وەری دەگرێت) بۆ ئافرەت دادەنێت.

شتێكی بەڵگەنەویستە كە زۆربەی ئەحكامەكانی لەمەڕ ژیانی كۆمەڵایەتی بەپێی چاودێری كردنی زۆربەی خەڵك دادەڕێژرێت و دەكرێن بە یاسا. خۆ زۆربەی ئافرەتانیش مێردیان دەبێت و ئەم مێردانەش بەخێو كردن و پاراستنی ئەو ئافرەتانەیان لە ئەستۆدا دەبێت، بەڵام زۆربەی پیاوان ناچارن هاوسەرەكانیان بەخێو بكەن و ئەركی نەفەقە و خەرجی‌یان هەڵبگرن.

جا ئەگەر ئافرەت سێ‌یەكی میراتی باوكی وەربگرێت (واتە نیوەی ئەوەی كە مێرد لە میراتی باوكی دەیكەوێت) ئەوا بێ‌گومان هەر مێردەكەی نەفەقەی دەكێشێت و خەرجی و پێداویستی‌یەكانیشی دەگرێتە ئەستۆ. بەڵام گەر پیاو دوو بەش (واتە نیوە)ی لە میراتی باوكی وەگرت ئەوا هەندێكی لە نەفەقەی هاوسەرەكەی‌دا خەرج دەكات و، بەمەش یەكسانی دێتە دی. واتە پیاو لەگەڵ خوشكەكەی‌دا (كە خێزانی پیاوێكە و مێردەكەی نەفەقەی دەكێشێت) یەكسان دەبێت.

بەڵێ، دادگەریی قورئان وا دەخوازێت[1]!

---

(١) ئەمە بڕگەیەكە لەو "لائیحە"یەی پێشكەش بە دادگای "تەمیز" كرا و، لە بەردەمی دادگادا خوێندرایەوە و دادگای بێ‌دەنگ كرد و، بوو بە پەراوێزی ئەم مەقامە:
(منیش بە دادگای بەڕێزی وەزارەتی دادگەری دەڵێم:
تاوانبار كردنی كەسێك كە بەرز و پیرۆزترین دەستووری خوایی تەفسیر دەكات، ئەو دەستوورەی كە حەقی ڕاستەقینەیە و لە هەموو سەردەمێكدا و لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا سێ‌سەد و پەنجا ملیۆن موسڵمان لە كاروباری ژیانی كۆمەڵایەتی‌یاندا پرس و ڕایان پێ‌یەتی و ڕەفتاری پێ دەكەن.. ئەو كەسەی كە لە تەفسیرەكەی‌دا پشت بەو شتانە دەبەستێت كە سێ سەد و پەنجا تەفسیرنووس تیایاندا یەكیان گرتووە و سەلماندوویانە و، شوێن ئەو بیروباوەڕە كەوتووە كە باپیرانی پێشوومان لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا باوەڕیان پێی بووە.. تاوانبار كردنی ئەم تەفسیرنووسە، بڕیارێكی ستەمكارانەیە و، بێ هیچ گومانێك دادگەری - ئەگەر لە ڕووی زەوی‌دا هەبێت - ڕەفزی دەكات و دەست بە ڕووی ئەو بڕیارەوە دەنێت و هەڵی دەوەشێنێتەوە). (دانەر)

★ *بناغەی چوارەم:*

قورئانی پیرۆز هەروەك بە توندوتیژی ڕێ لە "بت پەرستی" دەگرێت، بەهەمان شێوەش ئەو وێنانە قەدەغە دەکات کە وەك جۆرە بت ڕاگرتنێك وان! کەچی شارستانێتیی ئێستا ئەو وێنانە بە هەندێك لە تایبەتمەندی و چاکەکارییەکانی خۆی دادەنێت و دەیەوێت لەمەدا بەرەنگاری قورئان ببێتەوە. لە کاتێکدا کە وێنەکان، چ سێبەردار بن و چ بێ سێبەر، تێکڕا یان: ستەمێکی "بەردبوو".. یان ڕیایەکی "بەرجەستە".. یان هەوا و ئارەزوویەکی "پەیکەربوو"ن! چونکە هەوا و ئارەزووەکان دەوروژێنن و مرۆڤ بەرەو ستەم و ڕیا و هەوەسبازی پاڵ پێوە دەنێن.

پاشان "قورئان" بەزەیی بە ئافرەتاندا دێتەوە و، فەرمانی پۆشتەییان بە پۆشاکی شەرم و حەیا بۆ دەردەکات، بۆ مەبەستی پاراستنی ڕێز و حورمەتیان و، بۆ ئەوەش ئەو کانزا بەنرخانەی شەفەقەت و میهرەبانی و سەرچاوەی نیانی سۆز و بەزەیی، لە ژێر پێی زەلیلی و ڕسواییدا سووکایەتییان پێ نەکرێت و، بە وێنەی ئامرازێك بۆ هەوەسبازی و ئارەزووە نزم و بێنرخەکان، بەکار نەهێنرێن[1].

کەچی "شارستانێتیی نوێ" ئافرەتانی لە هێلانە و خانەکانی خۆیان هێناوەتەدەر و، پۆشاکی پۆشتەیی لەبەر دڕاندوون و، وای لە مرۆڤایەتیش کردووە گرفتاری شێتی ببێت! لە کاتێکدا کە هەموان دەزانین ژیانی خێزان بە: خۆشەویستی و ڕێز لەیەکترنانی نێوان ژن و مێرد، بەردەوام دەبێت. بەڵام ڕووت بوونی ئافرەت ئەو "خۆشەویستی"یە بێ گەرد و "ڕێز"ە گەرموگوڕەی نێوانیان ناهێڵێت و ژیانی خێزانیش ژەهراوی دەکات بە تایبەت بایەخدان بە "وێنەکان" کە پتر ڕەوشت تێك دەدەن و بە تەواوەتی دەیڕووخێنن و، گیانی مرۆڤ پاشەوپاش بەرەو دواوە دەبەنەوە.

مرۆڤ دەتوانێت بەمەی خوارەوە لەم مەبەستە تێ بگات:

هەروەك ڕوانینی پیاو، بە هاندەری ئارەزوو، بۆ تەرمی ئافرەتێکی جوانی مردوو – کە چاوەڕوان و موحتاجی بەزەییە – ڕەوشت و خووی مرۆڤ بە تەواوەتی دەڕووخێنێت، سەیرکردنیش بە نەزەری ئارەزوو بۆ وێنەی ئافرەتانی مردوو، یان وێنەی ئافرەتانی زیندوو کە لە حوکمی تەرمی بچووکی ئەواندان، بە هەمان جۆر، هەست و شعوورە بەرزەکانی مرۆڤ لەق دەکات و لەرزەیان پێ دەخات، تەنانەت دەشیانڕووخێنێت!

بەم جۆرە و بە وێنەی ئەم چوار مەسەلانە، هەموو یەکێك لە هەزارانی مەسەلە و بابەتەکانی قورئان، بەختەوەریی ژیانی دنیایان بۆ مرۆڤ لەخۆ گرتووە، هەروەك بەختەوەریی

(١) بڕیسکەی بیست و چوارەم بەوپەڕی بێ گومانی چەسپاندی کە : "پۆشتەیی" خواستێکی تەواو سروشتییە بۆ ئافرەت، بەڵام هەڵگرتنی پۆشتەیی پێچەوانەی فیترەت و سروشتیانە. (دانەر)

هەمیشەیی دواڕۆژیشی بۆ دەهێننەدی. دەتوانیت هەر بۆ خۆت مەسەلە و بابەتەكانی تر قیاس بكەیت بۆ سەر ئەمانەی كە باس كران.

هەروەها وەك شارستانێتیی نوێ لە بەردەم ئەو دەستوورانەی قورئاندا كە پەیوەندی‌یان بە ژیانی كۆمەڵایەتیی مرۆڤەوە هەیە، تێكدەشكێت و لە گۆشەی حەقیقەتەوە بەرامبەر بە ئیعجازی مەعنەویی قورئان نابووتی و ئیفلاسی دەردەكەوێت.. بە هەمان جۆر، گەر فەلسەفەی ئەوروپا و حیكمەتی مرۆڤیش - كە شارستانێتیی نوێیە - بە تەرازووی بیست و پێنج وتەكانی پێشوو لەگەڵ حیكمەتی قورئاندا بەراورد بكرێن، ئەوا كۆڵەواریی فەلسەفە و ئیعجازی حیكمەتی قورئان دەردەكەوێت. گەر حەز دەكەیت ئەمەت بۆ ڕوون ببێتەوە، فەرموو سەر لە وتەی دوازدەهەم و سیازدەهەم بدە، با كۆڵەواری و ئیفلاسی حیكمەتی فەلسەفە و، ئیعجاز و دەوڵەمەندیی قورئان بە چاوی خۆت ببینیت.

هەروەها وەك شارستانێتیی سەردەم لە بەردەم حیكمەتی عیلمی و عەمەلیی قورئاندا شكستی هێنا.. بەهەمان جۆر، ئەدەب و ڕەوانبێژی‌یەكەشی لە بەردەم ئەدەب و ڕەوانبێژیی قورئاندا شكستی هێناوە و، نیسبەتی نێوانیان وەك هی شینی هەتیوێك وایە كە بە گریانێكی تاڵی پڕ لە خەم و نائومێدی بگری، لە چاو گۆرانی و سروودی عاشقێكی داوێن پاكدا كە بۆ لێكدابڕانێكی كەمخایەن پەژارە دایگرتبێت و بەوپەڕی شەوق و ئاواتەوە گۆرانی بڵێت و پەژارەكەی پێ دەربڕێت! یان وەك هی هاواری مەستێك وایە كە لە بارێكی نزمدا بگەوزێت، لەچاو خوێندنەوەی چەند پارچە شیعرێكی حەماسی كە غیرەتی مرۆڤ ببزوێنن و خەڵكی بۆ بەخشینی گیان و سامان و شتی بەنرخ و بەدەستهێنانی سەركەوتن، هان بدەن!

چونكە ئەدەب و ڕەوانبێژی، لە ڕووی كاریگەریی شێوازەوە، یان "خەم" و پەژارە بەرهەم دێنن، یان "شادمانی" و خۆشی.. خۆ دیارە خەمیش لە خۆی‌دا دوو بەشە:

یان خەم و پەژارەیەكە لە "نەمان"ی خۆشەویست، واتە لە "نەبوون"ی خۆشەویستان و هاوڕێیانەوە پەیدا بووە و پەژارەیەكی پەست و تاریكی وەهایە كە شارستانێتیی چەپەڵبووی چڵكی "گومڕایی" و ئاوێتەی "غەفڵەت" و باوەڕدار بە "سروشت" بەرهەمی هێناوە.. یان پەژارەیەكە لە ئەنجامی "جودایی" و لێكدابڕانی خۆشەویستانەوە سەری هەڵداوە! واتە لەو ڕوانگەیەوە كە خۆشەویستان: نەفەوتاون.. ماون! بەڵام جودایی و لێكدابڕانیان پەژارەیەكی وەهای دەرخواردی مرۆڤ داوە كە تاسەمەندی و شەوقی بەیەك شادبوونی لە دووتوێدایە! جا ئەمە ئەو چەشنە خەم و پەژارەیەیە كە قورئانی ڕێپیشاندەر و ڕووناكیبەخش، لە دڵی مرۆڤدا بەجێی دەهێڵێت!

شادی و خۆشحاڵیش، بە هەمان جۆر، دوو بەشە:

یەكەم: خۆشحاڵی‌یەكە مرۆڤ بەرەو "ئارەزوو"ەكانی پاڵ پێوە دەنێت، كە ئەمەش ئەدەبە شارستانی‌یەكانی وەك ئەدەبی شانۆگەری و سینەمایی و ڕۆمان بۆ مرۆڤی فەراهەم دێنن.

بەڵام دووهەم: خۆشحالی‌یەکی ناسکی خاوێنە.. "دەروون" لەغاو دەکات و "ڕۆح" و "دڵ" و "ژیری" و "نهێنی"ش بەرەو خوو و ڕەفتاری بەرز و گەڕانەوە بۆ نیشتمانی ئەسڵی و نیشتەجێی هەتاهەتایی خۆیان و بۆ لای خۆشەویستەکانی دوارۆژیان، هان دەدات. هەر ئەم شادی و خۆشحاڵی‌یەیە کە قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجازی "بەیان" دەیبەخشێت و مرۆڤی بۆ لا دەبات و، تاسەمەندیی بەهەشت و بەختەوەریی هەمیشەیی و بینینی جوانیی خوای گەورەشی تێدا دەورووژێنێت.

هەندێ کەسانی کەم فام لەوانەی کە خۆیان لە تێرامان و سەرنجدانی شتاندا ماندوو ناکەن، لەو گومانەدا بوون کە: واتای مەزن و حەقیقەتی هەرە گەورەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنْسُ والْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هذا القُرْآنِ لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً﴾ وێنەیەکی مەحاڵە و، بە موبالەغەی ڕەوانبێژی‌یان لە قەڵەم داوە.. نەخێر وا نی‌یە و، ئەوانە گەلێ بە هەڵەدا چوون. چونکە ڕەوانبێژیی ئەم ئایەتە عەینی حەقیقەتە و، شێوە و ڕوویەکی مومکین و واقیع و گونجاوە و، هەرگیز کارێکی مەحاڵ نی‌یە.

یەکێك لە ڕووەکانی ئەو شێوەیە، بریتی‌یە لەوەی کە:

ئەگەر جوانترینی گوفتارەکانی جینیی و ئادەمیزاد، کە لە قورئانەوە وەرنەگیرابن و کەرەسەی ئەو نەبن، هەموو پێکەوە کۆبینەوە، ئەوا هەرگیز لە قورئان ناچن. بۆیە تا ئێستا شتێك لە وێنەی قورئان نەوتراوە و سەری هەڵنەداوە.

ڕووەکەی تریش بریتی‌یە لەوەی کە: شارستانێتی و حیکمەتی فەلسەفە و ئەدەبە بیانی‌یەکان، کە بەرهەم و زادەی کار و هەوڵ و کۆشش و بیری جینیی و ئادەمیزاد و تەنانەت شەیتانەکانیشن، لە نزمترینی پلەکانی دەستەوسانیدان لە بەردەم ئەحکام و دانایی و ڕەوانبێژیی قورئاندا! وەك پێشتر چەند نموونەیەکمان لەسەر هێنایەوە.

## جیلوەی سێهەم

## ئاراستەکردنی گوفتاری قورئان بۆ هەموو چینەکانی خەڵك

"قورئانی حەکیم" لەگەڵ هەموو چینێکی مرۆڤی گشت سەردەمێکدا دەدوێت، بە ڕادەیەك کە دەڵێی بە تایبەتی و ڕاستەوخۆ ڕووی لەو چینەیە!

چونکە مادەم قورئان سەرجەمی چینەکانی نەوەی ئادەم بانگ دەکات بۆ "ئیمان" کە بەرزترین و وردترینی زانستەکانە و.. بۆ "ناسینی خوا" کە فراوانترین و ڕووناکترینی زانیاری‌یەکانە و.. بۆ لای "ئەحکامەکانی ئیسلام" کە گرنگترینی زانستەکانە و لە

هه‌مووشیان جۆراوجۆرتره.. ئه‌وا ده‌بێ ئه‌و ده‌رسه‌ی كه به هه‌موو چینه‌كانی خه‌ڵكیی ده‌ڵێته‌وه له‌گه‌ڵ تێگه‌یشتنی هه‌موو یه‌كێكیاندا بگونجێت، له كاتێكدا كه ته‌نها یه‌ك ده‌رسه و چه‌ند ده‌رسێكی جیاجیا و جۆراوجۆر نیه‌! له‌به‌ر ئه‌وه، ده‌بێ له‌ناو خودی ئه‌و ده‌رسه‌ی قورئاندا چه‌ند چینێكی تێگه‌یشتن هه‌بێت. بۆیه هه‌موو چینێكی خه‌ڵكی و هه‌ریه‌كه‌ش به‌پێی پله‌ی تێگه‌یشتنی، به‌شی خۆی له ده‌رسی هه‌موو یه‌كێك له دیمه‌نه‌كانی قورئان وه‌رده‌گرێت!

گه‌لێ نموونه‌ی زۆرمان بۆ ئه‌م ڕاستی‌یه هێنایه‌وه، ده‌كرێت سه‌ریان لێ بدرێت. به‌ڵام لێره‌دا ته‌نها ئاماژه بۆ چه‌ند لایه‌نێكی ئه‌و نموونانه و به‌شی تێگه‌یشتنی یه‌ك دوو چینی خه‌ڵكی، ده‌كه‌ین.

❍ بۆ نموونه:

﴿لَمْ يَلِدْ ۞ وَلَمْ يُولَدْ ۞ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ﴾.

چینی "عه‌وام" كه زۆربه‌ی ڕه‌های خه‌ڵكی پێكده‌هێنن، به‌شیان له تێگه‌یشتنی ئه‌م ئایه‌تانه‌دا ئه‌وه‌یه كه:

(خوای گه‌وره بێ باوك و منداڵ و ژن و هاوتایه).

به‌شی چینێكی تری تێگه‌یشتنی مامناوه‌ندی، بریتی‌یه له:

(نه‌فی كردنی خوایه‌تی له: حه‌زره‌تی عیسا – درودی له‌سه‌ر بێت – و له مه‌لائیكه‌ت و، له هه‌ر شتێك كه منداڵ لێكه‌وتنه‌وه و له‌دایكبوونی له‌باردا بێت)! چونكه به‌پێی ڕواڵه‌ت نه‌فی كردنی شتی "مه‌حاڵ" كارێكی بێ سووده. كه‌واته ده‌بێ وه‌ك له زانسته‌كانی "ڕه‌وانبێژی"دا ڕوون كراوه‌ته‌وه، مه‌به‌ست: "لازمی حوكم"ه‌كه بێت. به‌م پێیه مه‌به‌ست له نه‌فی كردنی منداڵ و باوكایه‌تی، كه له تایبه‌تكاری‌یه‌كانی شتانی جیسمانین، نه‌فی كردنی خوایه‌تی‌یه له هه‌ر شتێك منداڵ و باوك و هاوتای ببێت و، بۆ ئه‌وه‌یه ده‌ری‌بخات كه: ئه‌وانه شایسته‌ی خوایه‌تی نین!

له‌م نهێنی‌یه‌وه ده‌رده‌كه‌وێت كه: ده‌گونجێت سووره‌تی "ئیخلاص" له هه‌موو كاتێكدا سوود به هه‌موو مرۆڤێك بگه‌یه‌نێت.

به‌شی چینێكی له‌وان پێشكه‌وتووتر، ئه‌وه‌یه كه:

(خوای گه‌وره خاوێنه له هه‌موو هاوبه‌ش و هاووێنه و یاریده‌ده‌رێك و له هه‌ر په‌یوه‌ندی‌یه‌ك به بوونه‌وه‌رانه‌وه كه بۆنی منداڵبوون و له‌دایكبوونیان لێ بێت. په‌یوه‌ندیشی به بوونه‌وه‌رانه‌وه ته‌نها په‌یوه‌ندی "خه‌للاقییه‌ت"ه، چونكه خواوه‌ند به ویستی ئه‌زه‌لی و ئیختیاری خۆی و به فه‌رمانی: "كن فیكون" بوونه‌وه‌ران به‌دی ده‌هێنێت و، هه‌رگیز

پەیوەندیی بە هیچ شتێکەوە نی‌یە کە پێچەوانەی سیفەتی "کەماڵ" بێــت، وەك: ناچـار بـوون و پەیدابوونی بێ ویست و ئیختیار).

بەشی چینێکی لەمانەش بەرزتر، ئەوەیە کە:

(خوای گەورە: ئەزەلی و، ئەبەدی و، ئەووەڵ و، ئاخر و، بێ‌وێنە و، بێ‌هاوتایە و، لـە هیـچ لایەکدا میسل و هاووێنە و نموونەی نی‌یە، نە لە زاتی‌دا و نە لە سیفەت و نە لە کردارەکـانی‌دا بەڵکو لە بەردەم مرۆڤدا تەنها بواری "مَثَل" هێنانەوە هەیە بۆ خوای گەورە: ﴿وَلَــــهُ الْمَثَــلُ الأَعَلى فِي السَّموات وَالأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (الـروم:٢٧) کـە ئەمـەش تەنـها لـە کـردار و کاروبارەکانی خوادا ڕێ بە "تەشبیهـ" و نموونەهێنانەوە دەدات).

دەتوانیت خاوەن بەشە جیاجیاکانی تـری تێگەیشـتن و پـەی بردنـی وەك: چینـی عارفـان و چینـی عاشـقان و چینـی صیدیقـان و غـەیری ئـەوانیش، بـۆ سـەر ئـەم چینـە ناوبراوانـە قیـاس بکەیت.

○ نموونەی دووهەم:

﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجالِكُمْ﴾ (الأحزاب:٤٠).

بەشی چینی یەکەمی خەڵك لەم ئایەتە، ئەوەیە کە:

حەزرەتی زەید – خوای لـێ ڕازی بێت ـ کە خزمەتگوزاری پێغەمبەر ﷺ و شـەرەفمەندی ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بە "کـوڕم!" بـانگی کـردووە. ئـەم زەیـدە، کـە هەسـتی کـرد هـاوکووفی هاوسەرە ئازیزەکەی نی‌یە، ناچار تەڵاقی دا. ئنجا پێغەمبەریش ﷺ بـە فـەرمانی خـوای گـەورە مارەی کرد.

جا ئەم ئایەتەی کە بەم هۆ و بۆنەیەوە نازڵ بووە، دەفەرموێ:

ئەگەر پێغەمبەر ﷺ وەك بانگ‌کردنی باوك لە کوڕی خۆی، ئێوەی بانگ کرد، ئەوا تەنـها لە ڕووی ئەرکی پێغەمبەرێتیی سەرشانیەوەیە کە بەو جۆرە بانگتان دەکات و، لە ڕاستی‌دا لـە ڕوانگەی کەسێتی و خزمایەتی‌یەوە باوکی هیچ کامتان نی‌یە، تا خێزانەکانی پێ نەشێن!

بەشی تێگەیشتنی چینی دووهەمیش، ئەوەیە کە:

مـیر و فـەرمانڕەوای مـەزن بـە چەشـنی بـاوکی بەسـۆز و میــهرەبان دەڕوانێتـە ڕەعیــەت و میللەتەکەی خۆی. جا ئەگەر ئەو فەرمانڕەوایە لـە ئاشـکرا و پەنهانیشـدا خـاوەنی دەستەڵاتی ڕۆحی بێت، ئەوا میهرەبانی‌یەکەی لە هی باوکان گەلـێ زیاتر دەبێــت، تەنانـەت خـەڵکییش، وەك بڵێی منالّی ڕاستەقینەی ئەو بن، بە وێنەی باوکی خۆیان بۆی دەڕوانن.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه ئه‌و ڕوانینه‌ی بۆ باوك ده‌ڕوانرێت ناگۆڕێت بۆ هی مێرد و، هی كچیش به ئاسانی ناگۆڕرێت به هی ژن و هاوسه‌ری پیاو، ئه‌وا له‌به‌ر ئه‌م نهێنی‌یه‌، بیری عامه‌ی خه‌ڵكی پێیان زه‌حمه‌ت و نه‌شیاو بوو. كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ كچی ئیماندارا‌ن ماره بكات!

له‌به‌ر ئه‌وه‌، قورئانی پیرۆز ئه‌م تێگه‌یشتنه هه‌ڵه‌یه‌یان بۆ ڕاست ده‌كاته‌وه و، پێیان ده‌فه‌رموێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ له گۆشه‌ی میهره‌بانیی خواوه‌ند و به چاوی شه‌فه‌قه‌ت و سۆز و به‌زه‌یی‌یه‌وه بۆتان ده‌ڕوانێت و، له ڕووی پێغه‌مبه‌رایه‌تی‌یه‌كه‌یه‌وه وه‌كو كوڕی خۆی مامه‌ڵه‌تان له‌گه‌ڵدا ده‌كات. به‌ڵام له ڕووی كه‌سێتیی مرۆڤانه‌ی خۆیه‌وه‌، ئه‌وا ئاشكرایه كه باوكی ئێوه نی‌یه‌، تاكو ماره‌كردنی كچانی ئێوه‌ی بۆ نه‌شێت و له‌سه‌ری حه‌رام بێت!

به‌شی سێ‌هه‌م، بهم جۆره له‌م ئایه‌ته تێ‌ده‌گات:

نابێ پشت به‌ستنتان به سۆز و به‌زه‌یی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و په‌یوه‌ندیتان پێ‌یه‌وه‌، بكه‌ن به بیانوویه‌ك بۆ ئه‌نجامدانی گوناه و كرده‌وه‌ی خراپ. چونكه زۆر كه‌س هه‌ن پشت به ڕابه‌ر و گه‌وره‌كانیان ده‌به‌ستن و له "كار" و "به‌ندایه‌تی"دا ته‌مبه‌ڵی ده‌كه‌ن. ته‌نانه‌ت هه‌ندێ جاریش ده‌ڵێن: "ئێمه نوێژ ناكه‌ین، چونكه نوێژمان بۆ كراوه"! (وه‌ك هه‌ندێ غولاتی شیعه ده‌یلێن).

سه‌رنجی چواره‌م:

به‌شێكی تر، ئاماژه‌یه‌كی غه‌یبی له‌م ئایه‌ته تێ‌ده‌گات كه بریتی‌یه له‌وه‌ی:

كوڕانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ناگه‌نه ته‌مه‌نی پیاوان. به‌ڵكو پێش ئه‌و ته‌مه‌نه خوای گه‌وره له دنیادا كۆچیان پێ ده‌كات. كه‌واته له‌به‌ر حیكمه‌تێكی خوایی، نه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له ڕووی ئه‌وه‌ی كه ڕاسته‌وخۆ نه‌وه‌ی ئه‌و بن، له "كوڕانی"دا به‌رده‌وام نابێت. به‌ڵام وشه‌ی "رجال" ئاماژه ده‌كات بۆ ئه‌وه‌ی كه: له ئافره‌تانی - نه‌ك پیاوانی - ئه‌ولادی ئه‌ودا، نه‌وه‌ی موباره‌كی هه‌ر به‌رده‌وام ده‌بن.

سوپاس بۆ خوای گه‌وره‌، حه‌زره‌تی "حه‌سه‌ن" و "حسه‌ین" كه وه‌چه‌ی پیرۆزی حه‌زره‌تی "فاطمة الزهـــراء"ن - خوایان لێ ڕازی بێت - دوو مانگی دره‌خشانن بۆ دوو زنجیره‌ی نوورانی كه هه‌میشه وه‌چه و نه‌وه‌ی پیرۆزی "ماددی و مه‌عنه‌وی"ی خۆری "نبووه‌ت" به به‌رده‌وامی ده‌هێڵنه‌وه!

اللهم صلّ عليه وعلى آله.

"ڕۆشنایی یه‌كه‌م" به هه‌ر سێ "تیشك"ه‌كانیه‌وه كۆتایی پێ هات.

* * *

# ڕۆشنایی دووهەم

## ئەم ڕۆشنایی‌یە سێ نووری هەیە

### نووری یەکەم

قورئانی پیرۆز: ڕەوانیی بە خوڕ و.. ساغیی ناوازە و.. پشتگیریی مەحکەم و.. پەیوەندیی توندوتۆڵ و.. هاوکاریی بەهێزی چ لە نێوان ڕستەکانی و چ لە نێوان سیما و ڕوخسارە پێکهێنەرەکانی ئەو ڕستانەدا کۆ کردووەتەوە. هەروەك هاوئاهەنگی‌یەکی بەرزی لە نێوان ئایەت و ئامانجەکانی‌دا ساز داوە. ئەمەش بە شایەتیی زانستی: "ڕەوانکاری" و "گوزارەکاری" و بە شایەتیدانی هەزاران پێشەوای ئەم زانستانە، وەك: زومەخشەری و سەککاکی و عەبدولقاهیری جورجانی..

خۆ هەرچەندەش نزیکەی هەشت نۆ هۆکاری گرنگ هەن کە ئەو هاوئاهەنگی و هاوکاری و پشتگیری و ساغی و ڕەوانی‌یە دەشێوێنن، کەچی ئەو هۆکارانە هیچ کاریگەری‌یەکیان لە شێواندنی ئەو سیفەتە ناوبراوانەی قورئاندا نەبووە، تەنانەت پتر پشتی ڕەوانی و ساغی و پشتگیریی ڕستە و ئایەت و ئامانجەکانی قورئانیان گرتووە! هێندە نەبێت کە حوکمی خۆیان ڕایی کردووە و لە پشت پەردەی ڕێسا و ڕەوانی‌یەوە سەریان دەرهێناوە، تاکو ڕەوانیی هۆنینی قورئان گەلێ واتای گەورە و بەنرخ بەدەستەوە بدات، بە وێنەی "چرۆ"ی درەخت کە لە قەدی خشت و ڕێکی درەختەکاندا دەردێن و هەندێ گۆپکە و چوکڵەی بەرز و نزمی تێدا پێکدەهێنن، کەچی ئەم وردە چوکڵانە ڕێکیی لەشولاری درەختەکان نائاڵۆزێنن، بەڵکو لە ڕێیانەوە ئەو بەروبوومانە بە درەختەکان دەدرێن کە پتر جوانی و کەماڵی ئارایشتی درەختەکەیان پێ تەواو دەبێت..

چونکە: قورئانی پیرۆز بەش بەش و پچڕپچڕ لە ماوەی بیست و سێ ساڵ و لە کاتی پێویستدا نازڵ بووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێندە پێکەوە گونجانی تەواوی دەرخستووە کە دەڵێی سەرانسەری قورئان بە یەك جار نازڵ بووە..

هەروەها ئەم قورئانە پیرۆزە لە ماوەی بیست و سێ ساڵ و لەبەر چەند هۆکارێکی جیاجیای نازڵ بوون هاتووە، کەچی ئەوەندە پشتگیریی تەواوەتیی تێدا دەردەکەوێت کە دەڵێی تەنها لەبەر یەك هۆکار نازڵ بووە..

هەروەها قورئان بۆ وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێکی دووپاتبووی جیاجیا هاتووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێندە تێکەڵی و یەکگرتنی تەواوی پێوە دیارە کە دەڵێی وەڵامی تەنها یەك پرسیارە..

هه‌روه‌ها قورئان بۆ ڕوونكردنه‌وه‌ی حوكمه‌كانی گه‌لێ ڕووداوی جۆراوجۆر نازڵ بووه، كه‌چی هێنده ڕێكوپێكیی كامڵ و ته‌واو پێشچاو ده‌خات كه ده‌ڵێی ڕوونكردنه‌وه‌ی حوكمی ته‌نها یه‌ك ڕووداوه..

هه‌روه‌ها ئه‌م قورئانه پیرۆزه به چه‌شنێك نازڵ بووه كه گوفتاره به‌رزه خواییه‌كانی هێناوه‌ته ئاستی چه‌ند شێوازێك كه له‌گه‌ڵ ڕاده‌ی تێگه‌یشتنی چه‌نده‌ها قسه بۆكراوی له‌ژماره‌به‌ده‌ر و گه‌لێ حاڵه‌تی وه‌رگرتن و تێگه‌یشتنی جۆراوجۆردا بگونجێ، كه‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا هێنده ڕه‌وانیی ناسك و له‌یه‌كچوونی جوانی له خۆدا ده‌رخستووه كه ده‌ڵێی ته‌نها بۆ یه‌ك حاڵه‌ت و یه‌ك ئاستی تێگه‌یشتن نازڵ بووه! ته‌نانه‌ت سیفه‌تی: "ڕه‌وانی"، به وێنه‌ی ئاوی سه‌لسه‌بیل، به‌ناو هه‌موو قورئاندا گوزه‌ر ده‌كات..

هه‌روه‌ها ئه‌و قورئانه پیرۆزه ڕووی گوفتاری ئاراسته‌ی گه‌لێ جۆر و چینی له یه‌ك دووری خه‌ڵكی كردووه، كه‌چی هێنده ئاسانیی "به‌یان" و، پاراویی ڕێسا و ڕوونیی تێگه‌یاندنی تێدا دیاره كه ده‌ڵێی گشت ئه‌وانه‌ی له‌گه‌ڵیان ده‌دوێت ته‌نها یه‌ك چین و توێژن، به ڕاده‌یه‌ك كه هه‌موو كۆمه‌ڵ و توێژێك پێی وایه ڕووی گوفتاری قورئان ڕاسته‌وخۆ ئاراسته‌ی ئه‌و كراوه..

هه‌روه‌ها قورئان بۆ ئه‌وه نازڵ بووه كه: خه‌ڵكی به‌ره‌و چه‌ند ئامانجێكی ئیرشادیی پله‌پله و جیاجیا ڕێنمایی بكات، كه‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا هێنده: ئیستیقامه‌تی ته‌واوه‌تی و.. هاوسه‌نگیی ورد و.. ڕێكوپێكیی جوان و ڕه‌نگینی پێوه دیاره كه ده‌ڵێی ته‌نها بۆ یه‌ك ئامانج نازڵ بووه.

جا هه‌رچه‌ند ئه‌م هۆكارانه مایه‌ی هه‌ڵبزركان و شێواندنی واتا و ڕوخسارن، كه‌چی هه‌موویان له ده‌رخستن و پیشاندانی: ئیعجازی به‌یان و، ڕه‌وانی و، له‌گه‌ڵ یه‌ك گونجانی قورئاندا، به‌كار هێنراون!

به‌ڵێ، هه‌ركه‌سێك خاوه‌نی دڵێكی ساغ و عه‌قڵێكی كامڵ و ویژدانێكی هه‌ستیار و چێژێكی ته‌واو بێت، هه‌ر بۆ خۆی: ڕه‌وانییه‌كی جوان و.. ڕێكوپێكییه‌كی ناسك و.. ئاوازێكی به‌تام و.. زمانپاراوییه‌كی بێوێنه، له ڕوونكردنه‌وه‌كانی قورئانی پیرۆزدا ده‌بینێت! خۆ هه‌ركه‌سێكیش بینایی دڵی كوێر نه‌بووبێت، بێ هیچ گومانێك "چاو"ێك له قورئاندا ده‌بینێت كه قورئانی پیرۆز به‌هۆی ئه‌و چاوه و به‌وپه‌ڕی ڕوونی: سه‌رجه‌می بوونه‌وه‌رانی ڕواڵه‌تی و نادیار ده‌بینێت و به وێنه‌ی لاپه‌ڕه‌ی كتێبێك ده‌بن له به‌رده‌ستیدا كه به ویستی خۆی هه‌ڵیانده‌گێڕێته‌وه و، به هه‌ر شێوازێك بیه‌وێت واتاكانی لێك ده‌داته‌وه و به خه‌ڵكییان ده‌ناسێنێت!

گه‌ر بمانه‌وێت ڕاستیی ئه‌م "نووری یه‌كه‌م"ه به نموونه‌كانیه‌وه ڕوون بكه‌ینه‌وه، ئه‌وا پێویستمان به نووسینی چه‌ند به‌رگێك ده‌بێت! بۆیه به‌و ڕوونكردنه‌وانه واز ده‌هێنین كه تایبه‌تن

بەم ڕاستییە و لە گشت "پەیامە عەرەبییەکان"[١] و "إشارات الإعجاز" و بیست و پێنج وتەکانی پێشوودا باس کراون. بگرە هەر قورئان بۆ خۆی سەرتاپا نموونەی ئەم حەقیقەتەیە، بۆیە وا بە یەك جار هەموو قورئان پێشچاو دەخەم و بە نموونە دەیهێنمەوە!

## نووری دووهەم

### ئەم نوورە، لە "تایبەتکاریی ئیعجاز"ی ئەو پوختە باس و ناوە جوانانەی خوای گەورە دەکۆڵێتەوە کە شێوازی ناوازەی قورئان لە کۆتایی ئایەتەکاندا دایناون

**بێدارکردنەوەیەك:**

لەم نووری دووهەمەدا گەلێ ئایەت دەهێنینەوە کە تەنها تایبەت نین بەم نوورەوە، بەڵکو دەشبن بە نموونە بۆ بابەت و تیشکەکانی پێشووتریش. خۆ ئەگەر بمانەوێت مافی ڕوونکردنەوەی تەواوەتی بەم نموونانە بدەین، باسەکەمان درێژە دەکێشێت. بەڵام من لەم کاتەی ئێستادا ناچارم بە پوختی لێیان بدوێم، بۆیە لێرەدا زۆر بە کورتی ئاماژەمان بۆ ئەو ئایەتانە کردووە کە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم نهێنییە مەزنەی ئیعجازی قورئان، بە نموونە هێناومانەتەوە. بەو هیوایەی درێژەپێدانی باسەکە بۆ کاتێکی تر هەڵبگرین.

ئەوەتا قورئانی پیرۆز زۆربەی جار هەندێ چەمکی پوخت و کورت لە کۆتایی ئایەتەکاندا دادەنێت. جا ئەو پوختانە: یان چەند ناوێکی جوانی خوای گەورە، یان واتای ئەو ناوانەی خوایان لەخۆ گرتووە.. یاخود کێشە و باسەکانیان حەوالەی "ژیری" دەکەن و مرۆڤ بۆ بیرکردنەوە و تێرامانیان هان دەدەن.. یان دەستوورێکی کوللیی نێوان ئامانجەکانی قورئانیان تێدایە کە پشتی ناوەڕۆکی ئایەتەکە دەگرێت.

بەڵێ، ئەو پوختە کۆتاییانەی ئایەتەکان، هەندێ ئاماژەی حیکمەتی بەرز و بڵندی قورئان و.. چەند پریشکێکی ئاوی ژیانبەخشی هیدایەتی ئیلاهی و.. هەندێ پزیسکی برووسکەی ئیعجازی قورئانیان لە ئامێز گرتووە.

وا لێرەدا تەنها "دە" دانە لەو ئاماژە زۆر و زەبەندانە بە کورتی باس دەکەین. هەروەك بە ئاماژە بۆکردن تەنها یەك نموونەی نێوان نموونە زۆرەکانی و.. یەك واتای پوختی تەنها یەك ڕاستیی نێوان ڕاستییە زەبەندەکانی هەریەك لەو نموونانەش، دەخەینە ڕوو.

زۆربەی ئەم "دە" ئاماژانەش لە زۆربەی ئایەتەکاندا کۆ دەبنەوە و، نەخش و نیگارێکی ئیعجازیی ڕاستەقینە پێکدەهێنن، هەروەك زۆربەی ئەو ئایەتانەی کە بە نموونەی ئاماژەیەك دەیانهێنینەوە، نموونەن بۆ زۆربەی ئاماژەکانی تریش.

---

(١) سیازدە پەیامن لە ناوەندی کتێبی (مەسنەویی نووری)دا، کە بەرگێکی سەربەخۆی سەرجەمی پەیامەکانی نورە. (وەرگێڕ)

وا لە هەموو ئایەتێکدا تەنها یەك ئاماژە ڕوون دەکەینەوە و، سوو کەڵە ئاماژەیەکیش بۆ واتاکانی ئەو ئایەتانە دەکەین کە لە چەند "وتە"یەکی پێشووتردا لێیان دواوین.

◆ **یەکەم تایبەتکاریی "پاراوی":**

قورئانی پیرۆز، بە ڕوونکردنەوە ئیعجازبەخشەکانی خۆی، کار و ئاسەوارەکانی کردگاری مەزن لە پێش‌چاودا ڕادەخات، پاشان ناوە جوانەکانی خواوەند لەو کار و ئاسەوارانەیدا دەردەهێنێت، یاخود یەکێك لە ئامانجە بنەڕەتییەکانی قورئان، وەك: "حەشر" و "تەوحید" دەچەسپێنێت.

ئەم ئایەتەی خوارەوە یەکێکە لە نموونەکانی واتای یەکەم:

**﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوى إِلى السَّماءِ فَسَوّاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾** (البقرة:٢٩).

ئەم ئایەتەی خوارەوەش یەکێکە لە نموونەکانی واتای دووهەم:

**﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الأَرْضَ مِهَاداً ❁ وَالْجِبَالَ أَوْتاداً ❁ وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجاً ❁ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتاً ❁ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاساً ❁ وَجَعَلْنَا النَّهارَ مَعَاشاً ❁ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعاً شِداداً ❁ وَجَعَلْنَا سِراجاً وَهَّاجاً ❁ وَأَنْزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِراتِ ماءً ثَجَّاجاً ❁ لِنُخْرِجَ بِهِ حَبّاً وَنَبَاتاً ❁ وَجَنَّاتٍ أَلْفَافاً ❁ إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كانَ مِيقَاتاً﴾** (النبأ:٦-١٧)

لە ئایەتی یەکەمدا: قورئانی پیرۆز ئەو ئاسەوارە مەزنانەی خوای گەورە پێش‌چاو دەخات کە بە ئامانج و ڕێساکانیان بەڵگەن لەسەر "زانست" و "توانست"ی خواوەند، ئەمەش دەکات بە پێشەکیی ئەنجامێکی گرنگ و مەبەستێکی مەزن. پاشان ناوی جوانی "العلیم"ی خوای گەورەی لێ دەردەهێنێت.

لە ئایەتی دووهەمیشدا: کار و ئاسەوارە گەورەکانی خواوەند باس دەکات و، پاشان لە دەرەنجامدا باسی "حەشر" دەردەهێنێت کە ڕۆژی "فەصل"ە. هەروەك لە خاڵی سێ‌هەمی تیشکی یەکەمی ڕۆشنایی یەکەمدا ڕوون کرایەوە.

◆ **دووهەم سەرنجی ڕەوانبێژی:**

قورئانی پیرۆز، چنراوانی سنعەتی خواوەند لە پێش‌چاوی مرۆڤدا ڕادەخات، پاشان لە ناوەندی ناوە جوانەکانی خوا و لە پوختە کۆتایی ئایەتەکاندا کۆیان دەکاتەوە و دەیانپێچێتەوە.. یاخود حەواڵەی "ژیری"یان دەکات..

یەکێك لە نموونەکانی بەشی یەکەم، ئەم ئایەتەیە:

**﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالأَبْصارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللهُ فَقُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ ❁ فَذلِكُمُ اللهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ﴾** (یونس:٣١-٣٢).

ئەوەتا لە پێشدا دەفەرموێ: (کێ زەوی و ئاسمانی وەك چەند گەنجینەیەکی ڕۆزی بۆ ئامادە کردوون و، لەوێ بارانی هێناوەتە خوار و لێرەش دەغڵ و دانی دەرهێناوە؟ یان ئایا کێ هەیە جگە لە "خوا" بتوانێت ئەو ئاسمانە مەزن و زەوی‌یە گەورەیە وەك دوو خەزنەدار و گەنجینەوانی گوێڕایەڵ لێ بکات بۆ فەرمانەکانی خۆی؟ کەواتە شوکر و سوپاس و ستایش تەنها هەر بۆ ئەو کەسەیە)..

لە بڕگەی دووهەمیشدا دەفەرموێ: (کێ خاوەنی هەستی "بیستن" و "بینین"ی ئێوەیە، کە بەنرخترین شتانی ناو ئەندامەکانتانن؟ ئایا لە چ کارگە و دوکان و بازاڕێکدا کڕیوتانن؟ باش بزانن تەنها ئەو کەسە خاوەن و "پەروەردگار"تانە کە ئەم هەستە ناسکانەی وەك چاو و گوێی پێ بەخشیون و، هەر ئەویش بەدیی‌هێناون و پەروەردەی کردوون. کەواتە هەر تەنها ئەو – نەك کەسی تر – شایانی پەرستش و بەندایەتی بۆ کردنە)..

لە بڕگەی سێ‌هەمیشدا دەفەرموێ: (یان کێیە ئەو کەسەی کە هەروەك زەوی زیندوو دەکاتەوە، سەدان هەزار دەستە و تاقمی مردووانیش زیندوو دەکاتەوە و ژیانیان پێ دەبەخشێتەوە؟ کێ هەیە جگە لە خواوەندی "حەق" و بەدیهێنەری گەردوون توانای ئەم کارەی ببێت؟ بێ گومان هەر ئەوە کە ئەم کارە ئەنجام دەدات و زەویی وشك هەڵهاتووی مردوو، زیندوو دەکاتەوە. خۆ مادەم خواوەند خوایەکی "حەق"ە، ئەوا هیچ حەقێکی لەلا نافەوتێ و، وەك زەویی زیندوو کردەوە ئێوەش زیندوو دەکاتەوە و بۆ دادگای مەزنتان دەنێرێت)..

لە بڕگەی چوارەمیشدا دەفەرموێ: (کێ هەیە جگە لە "خوا" بە جۆرێکی ڕێکوپێك و بە ئەندازەی ئاسانیی بەڕێوەبردنی کۆشکێك یان شارێك، کاروباری ئەم گەردوونە مەزنە بەڕێوە ببات؟ خۆ مادەم جگە لە "خوا" کەسی تر نی‌یە، ئەوا هیچ ناتەواوی‌یەکیش لەو توانستەدا نی‌یە کە دەتوانێت بەوپەڕی ئاسانی ئەم گەردوونە مەزنە و گشت تەن و قەبارەکانی ناوی بەڕێوە ببات و، چ پێویستی‌یەکی بە "هاوبەش" و "یارمەتی‌دەر" نی‌یە، بەڵکو توانستێکی هێندە ڕەهایە کە "سنوور" ناتوانێت سنووری بۆ دەستنیشان بکات! هەروەها ئەو کەسەی کە کاروباری ئەم گەردوونە مەزنە دەسازێنێت، هەرگیز بەڕێوەبردنی بەدیهاتووە بچووکەکانیش بە کەسی تر ناسپێرێت.. کەواتە ئێوە ناچارن لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا بڵێن: جگە لە "خوا" کەسی تر نی‌یە)!

ئەوەتا دەبینیت بڕگەی یەکەم و چوارەم دەڵێن: "خوا"(الله) و.. بڕگەی دووهەمیش دەڵێت: "پەروەردگار"(الرب).. هەروەك سێ‌هەمیش دەڵێت: "حەق"(الحق)! دەسا ئیتر فەرموو مەودای ئیعجاز تێبگە لە شوێنی ڕستەی: ﴿**فَذٰلِكُمُ اللهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ**﴾دا!

بەم جۆرە قورئانی پیرۆز: کارە گەورەکانی خواوەند و چنراوە مەزنەکانی سنعەتی ئەو باس دەکات، پاشان ناوی ئەو دەستە کاریگەرە دەهێنێت کە بەڕێوەبەر و کارسازی ئەو

چنراوه مه‌زن و ئاسه‌واره گه‌ورانه‌یه: ﴿فَذلِكُمُ اللهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ﴾! واته به هێنانی ناوه‌كانی: "الله، الرب، الحق"ی خوای گه‌وره، سه‌رچاوه‌ی ئه‌و كاره مه‌زنانه پێش‌چاو ده‌خات!

یه‌كێك له نموونه‌كانی به‌شی دووهه‌میش، ئه‌م ئایه‌ته‌یه:

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّموات وَالأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِما يَنْفَعُ النَّاسَ وَما أَنْزَلَ اللهُ مِنَ السَّماءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فيهَا مِنْ كُلِّ دابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لآيات لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (البقرة:١٦٤).

قورئانی پیرۆز له‌م ئایه‌ته‌دا دره‌وشانه‌وه‌ی ئه‌و "ده‌سته‌ڵاتداری"یه‌ی خواوه‌ند باس ده‌كات كه له به‌دیهێنانی ئاسمانه‌كان و زه‌ویدایه و، دره‌وشانه‌وه‌ی كه‌ماڵی "توانست" و گه‌وره‌یی "په‌روه‌ردگاریتی"ی خوا ده‌رده‌خات و، شایه‌تی له‌سه‌ر "یه‌كتایی" ئه‌و ده‌دات..

هه‌روه‌ها دره‌وشانه‌وه‌ی "په‌روه‌ردگاریتی" له جیاوازیی شه‌و و ڕۆژدا و.. ده‌ركه‌وتنی "میهره‌بانی" له ڕامكردن و به‌كارهێنانی كه‌شتی و گێڕانی به‌ناو ده‌ریادا، كه ئه‌مه‌ش یه‌كێكه له هۆكاره گه‌وره‌كان له ڕه‌وتی ژیانی كۆمه‌ڵایه‌تی‌دا و.. دره‌وشانه‌وه‌ی "گه‌وره‌یی توانست" له باراندنی ئاوی مایه‌ی ژیان له ئاسمانه‌وه بۆ زه‌ویی مردووی وشك و برنگ و، زیندووكردنه‌وه‌ی زه‌وی خۆی و زینده‌وه‌رانی ناوی كه له سه‌دان هه‌زار زیاتر ده‌بن و، پیشاندانی زه‌وی به شێوه‌ی پیشانگایه‌ك بۆ شتانی نامۆ و سه‌رسووڕهێنی به‌دیهاتووی خواوه‌ندی په‌روه‌ردگار..

هه‌روه‌ها دره‌وشانه‌وه‌ی "میهره‌بانی و توانست" باس ده‌كات له به‌دیهێنانی چه‌نده‌ها گیانله‌به‌ری جۆراوجۆر له "گڵ"ێكی ئاسایی..

هه‌روه‌ها دره‌وشانه‌وه‌ی "میهره‌بانی و دانایی" ده‌خاته‌ڕوو له‌و كارمه‌ندی‌یه مه‌زنانه‌دا كه به "باكان"ی ده‌سپێرێت، وه‌ك: پیتاندن و هه‌ناسه پێدانی ڕووه‌كه‌كان و یارمه‌تیی هه‌ناسه‌دانی زینده‌وه‌ران به جووڵاندن و به‌ڕێوه‌بردنی هه‌ناسه‌دانیان.

هه‌روه‌ها دره‌وشانه‌وه‌ی "په‌روه‌ردگاریتی"ش ده‌رده‌خات له مه‌لكه‌چ كردن و كۆكردنه‌وه و بڵاوه پێكردنی هه‌وره هه‌ڵواسراوه‌كانی نێوان ئاسمان و زه‌وی‌دا، كه وه‌ك سه‌ربازی گوێڕایه‌ڵ بۆ مه‌به‌ستی حه‌وانه‌وه بڵاوه‌ی لێ ده‌كه‌ن. به‌ڵام پاش ئه‌وه، له نمایشێكی گه‌وره‌دا، بۆ وه‌رگرتنی فه‌رمانه‌كان سه‌رله‌نوێ كۆ ده‌بنه‌وه!

به‌م جۆره و دوای پێش‌چاوخستنی چنراوانی سنعه‌تی خوایی، "ژیری" ده‌خاته گه‌ڕ بۆ لێكۆڵینه‌وه و دۆزینه‌وه‌ی ڕاستی‌یه‌كانیان و ده‌فه‌رموێ: ﴿لآيات لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾! كه به‌مه‌ش جڵه‌وی "ژیری" به‌ره‌و بیركردنه‌وه ڕاده‌كێشێت و بۆ تێفكرینیش بێداری ده‌كاته‌وه.

◆ **سێهه‌م تایبه‌تكاریی "پاراوی":**

قورئانی پیرۆز، هه‌ندێ جار به دوور و درێژی كاره‌كانی خوای گه‌وره باس ده‌كات، پاشان له پوخته‌یه‌كی كه‌مدا كورتیان ده‌كاته‌وه. جا قورئان به درێژه‌پێدانی ئه‌و كارانه،

قەناعەت و دڵنیایی بە مرۆڤ دەبەخشێت و، بە پوخت هێنان و کورت کردنەوەشیان کارێك دەکات کە بە ئاسانی لەبەر بکرێ و لە یاد بگیرێت، بۆ نموونە:

﴿وَكَذلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِنْ تَأْوِيلِ الأَحاديثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَعَلى آلِ يَعْقُوبَ كَمَا أَتَمَّهَا عَلى أَبَوَيْكَ مِنْ قَبْلُ إِبراهيمَ وَإِسْحاقَ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (يوسف:٦).

قورئانی پیرۆز، بەم ئایەتە ئاماژە بۆ ئەو نیعمەتانە دەکات کە خوای گەورە بە حەزرەتی یوسف و باپیرانی پێشینی ئەوی بەخشیبوون. ئەوەتا دەفەرموێ: هەر تەنها خوای گەورە ئێوەی لە نێوان نەوەی ئادەمدا بۆ پلەی "پێغەمبەرایەتی" هەڵبژارد و، زنجیرەی گشت پێغەمبەرانی لەگەڵ زنجیرەکەی ئێوەدا گرێ دا و، کردنی بە سەرگەورەی زنجیرەکانی تری نەوەی ئادەم. هەروەك بنەماڵەی ئێوەشی کرد بە مایەی فێرکردن و ڕێنمایی، ئەوەتا زانستە خوایی و دانستە پەروەردگارییەکان فێری خەڵکی دەکەن و.. بەو پێیە دەستەڵاتی بەختەوەرانەی دنیا و بەختەوەریی هەمیشەیی دواڕۆژیشی بۆ کۆ کردوونەتەوە و.. بە "عیلم" و "حیکمەت" تۆیشی کرد بە عەزیزی میسر و پێغەمبەرێکی مەزن و ڕابەرێکی دانا..

دوای ئەوەی کە قورئان ئەو نیعمەتانە باس دەکات و دەیانژمێرێت و، تێی‌دەگەیەنێت کە چۆن خوای گەورە: خۆی (واتە حەزرەتی یوسف) و باوك و باپیرانی بە "عیلم" و حیکمەت" تایبەتمەند کردووە .. دوای ئەوە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾! واتە پەروەردگاری و حیکمەتی ئەو خواستیان وا بووە کە خۆت و باپیرانت بەهرەمەندی ناوی جوانی: "العليم الحكيم" بن!

بەم جۆرە، ئەو نیعمەتە درێژەپێدراوانەی لەم پوختەیەدا کورت کردەوە!

هەروەها وەك ئەم ئایەتانە:

﴿قُلِ اللَّهُمَّ مالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشاءُ بِيدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ على كُلِّ شَيْءٍ قَديرٌ ۞ تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَنْ تَشاءُ بِغَيْرِ حِسابٍ﴾ (آل عمران:٢٦-٢٧).

ئەم ئایەتە پیرۆزانە کارەکانی خواوەندمان لە کۆمەڵگای ئادەمیزاددا پێش‌چاو دەخەن ، ئنجا ئەوەش دەگەیەنن کە:

عیززەت و زەلیلی.. دەوڵەمەندی و هەژاری، ڕاستەوخۆ پەیوەستن بە ویست و ئیرادەی خواوەند خۆیەوە. واتە:

(دەست وەردان لە کاروباری چینە هەرە پەرتەوازەکانی بوونەوەرە زۆر و زەبەندەکان، تەنها بە "ویست" و "نەخشە" و "تەقدیر"ی خوای گەورەیە و، هەرگیز "ڕێکەوت" ناتوانێت توخنی ئەو کارانە بکەوێت)!

دوای ئه‌وه‌ی كه ئایه‌ته‌كه ئه‌م حوكمه‌ی گه‌یاند، ئنجا ده‌فه‌رموێ: گه‌وره‌ترین شت له‌ ژیانی مرۆڤدا ڕۆزی‌یه‌كه‌یه‌تی.. پاشان به‌ چه‌ند پێشه‌كی‌یه‌ك ده‌یچه‌سپێنێت كه‌: "ڕۆزی" ڕاسته‌وخۆ له‌ گه‌نجینه‌ی ڕۆزیده‌ری ڕاسته‌قینه‌وه‌ دێت و ده‌نێرڕێت. چونكه‌ ده‌فه‌رموێ: ڕۆزیتان به‌ ژیانی زه‌وی‌یه‌وه‌ به‌ستراوه‌ و، ژیانی زه‌ویش پابه‌ندی به‌هاره‌. خۆ به‌هاریش ته‌نها به‌ده‌ست ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ خۆر و مانگ ملكه‌چ و فه‌رمانبه‌ردار ده‌كات و شه‌و و ڕۆژ به‌ دوای یه‌كتردا ده‌هێنێت. كه‌واته‌ به‌خشینی سێوێك به‌ هه‌ر مرۆڤێك – كه‌ ڕۆزیی ڕاسته‌قینه‌ی خۆی بێت – كاری ته‌نها ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ زه‌وی له‌ میوه‌ و به‌روبوومه‌ جۆراوجۆره‌كان پڕ ده‌كات، كه‌ "ڕۆزیده‌ری ڕاسته‌قینه‌"یه‌!

دوای ئه‌وه‌، قورئانی پیرۆز ئه‌و كاره‌ درێژه‌ پێدراوانه‌، له‌م پوخته‌یه‌دا كورت ده‌كاته‌وه‌ و ده‌یانچه‌سپێنێت: ﴿وَتَرْزُقُ مَنْ تَشاءُ بِغَيْرِ حِسابٍ﴾!

**◆ چواره‌م سه‌رنجی ڕه‌وانبێژی:**

هه‌ندێ جار قورئانی پیرۆز به‌ ڕیزكردن و ته‌رتیبێكی دیاریكراو باسی به‌دیهاتووه‌كانی خواوه‌ند ده‌كات. پاشان به‌م كاره‌ی ده‌ری ده‌خات كه‌ بوونه‌وه‌ران به‌: "ڕێسا" و "كاری به‌ ته‌رازوو" به‌دی دێن، كه‌ ئه‌م دوانه‌ش به‌ری دره‌ختی به‌دیهاتووان پیشان ده‌ده‌ن. وه‌ك بڵێی جۆره‌ ڕوونی و دره‌خشانی‌یه‌ك به‌و به‌دیهاتووانه‌ ده‌به‌خشێت كه‌ ناوه‌ جوانه‌كانی خوایان تێدا ده‌دره‌وشێته‌وه‌.. ده‌ڵێی ئه‌و به‌دیهاتووانه‌ بریتین له‌ "وشه‌" و ئه‌و ناوانه‌ش "واتا"كانیانن.. یان به‌دیهاتووه‌كان چه‌ند "به‌ر"ێكن و ئه‌و ناوانه‌ش ناوك و كاكڵه‌كانیانن! بۆ نموونه‌:

**﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسانَ مَنْ سُلالَةٍ مِنْ طِينٍ ۞ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرارٍ مَكِينٍ ۞ ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنا الْمُضْغَةَ عِظاماً فَكَسَوْنا الْعِظامَ لَحْماً ثُمَّ أَنْشَأْناهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخالِقِينَ﴾** (المؤمنون:١٢-١٤).

قورئانی پیرۆز له‌م ئایه‌تانه‌دا به‌دیهاتنی مرۆڤ و قۆناغه‌ سه‌رسووڕهێن و نامۆ و ناوازه‌ و هاوسه‌نگ و ڕێكوپێكه‌كانی هێنده‌ به‌ ته‌رتیب باس ده‌كات كه‌ وه‌ك ئاوێنه‌: ﴿فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخالِقِينَ﴾ی تێدا ده‌رده‌كه‌وێت! ته‌نانه‌ت ده‌ڵێی هه‌موو یه‌كێك له‌و قۆناغانه‌ خۆی ده‌رده‌خات و له‌به‌ر خۆیه‌وه‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ وه‌حی ده‌كات و ده‌یڵێته‌وه‌! ته‌نانه‌ت یه‌كێك له‌ "نووسه‌رانی وه‌حی" له‌ كاتی نازڵ بوونی ئه‌م ئایه‌ته‌ و له‌ ده‌می نووسینه‌وه‌ی‌دا و پێش ئه‌وه‌ی بگاته‌ سه‌ر ئه‌م كۆتایی‌یه‌، له‌ سه‌رسووڕماندا له‌به‌ر خۆیه‌وه‌ وتی: ﴿فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخالِقِينَ﴾! بێ ئه‌وه‌ی بزانێت كه‌ ئه‌و ئایه‌تانه‌ به‌م بڕگه‌یه‌ كۆتایی پێ دێت! به‌ ڕاده‌یه‌ك كه‌وته‌ گومانه‌وه‌ كه‌ بڵێت: "ئایا وه‌حی بۆ منیش هاتووه‌؟" له‌ ڕاستی‌دا كه‌ماڵی "ڕێسا" و "ڕوونی"ی له‌ڕاده‌به‌ده‌ر و "له‌گه‌ڵ یه‌ك گونجان"ی ته‌واوه‌تیی گوفتاری یه‌كه‌م، پێش هاتنی ئه‌م ڕسته‌یه‌، خۆی ده‌رده‌خات!

هەروەها وەك ئایەتی:

﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللهُ الَّذي خَلَقَ السَّموات وَالأَرْضَ في سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوى على الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّراتٍ بِأَمْرِهِ أَلا لَهُ الْخَلْقُ والأَمْرُ تَبارَكَ اللهُ رَبُّ الْعالَمِينَ﴾ (الأعراف:٥٤).

قورئانی پیرۆز بەم ئایەتە: گەورەیی توانستی خوا و دەستەڵاتی پەروەردگاریتی‌یەکەی، بە جۆرێك دەردەخات کە دەبێ بە بەڵگە لەسەر بەتوانایەکی شکۆمەندی ئەوتۆ کە لە عەرشی پەروەردگاریتیی خۆیەوە نیشانەکانی "پەروەردگاریتی"یەکەی لەسەر لاپەڕەکانی گەردووندا دەنووسێت و، شەو و ڕۆژ بە وێنەی دوو شریت لێ دەکات کە یەك لە دوای یەك پیشان دەدرێن و، خۆر و مانگ و ئەستێرەکانیش بە وێنەی سەربازی گوێڕایەڵ بۆ وەرگرتنی فەرمان ئامادە دەکات. لەبەر ئەوە، هەر "ڕۆح"ێك کە ئەم ئایەتە دەبیستێت یەکسەر دەڵێت: "بارك الله، ماشاء الله، فتبارك الله رب العالمين". واتە ڕستەی: ﴿تَبارَكَ اللهُ رَبُّ الْعالَمِينَ﴾ وەك پوختەیەکی ڕستەکانی پێشوو وایە و، لە حوکمی بەر و ناوك و ئاوی ژیانیاندایە!

◆ **پێنجەم تایبەتکاریی "پاراوی":**

هەندێ جار قورئانی پیرۆز لایەنە جوزئی‌یەکانی ئەو ماددانە باس دەکات کە: دووچاری ئاڵوگۆڕ دێن و گەلێ چۆنێتی و بارودۆخی جۆراوجۆریشیان تێدا ڕوو دەدات. ئنجا بۆ ئەوەی ئەو لایەنە جوزئی‌یانە بکات بە چەند ڕاستی‌یەکی چەسپاو، دەچێ تۆماریان دەکات و بە ناوە جوانەکانی خواوەند - کە نوورانی و هەمەکی و چەسپاون - کورتیان دەکاتەوە.. یان پوختەیەك دەهێنێت کە "ژیری"ی مرۆڤ بۆ بیرکردنەوە و پەند وەرگرتن ڕادەپێچ دەکات..

یەکێك لە نموونەکانی واتای یەکەم، ئەم ئایەتەیە:

﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْماءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلى الْمَلائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِؤُني بِأَسْمآءِ هؤلآءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ۞ قَالُوا سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ (البقرة:٣١-٣٢).

ئەم ئایەتە لە پێشدا ڕووداوێکی جوزئی باس دەکات کە بریتی‌یە لەوەی: هۆی پێشخستن و فەزڵدانی حەزرەتی ئادەم بەسەر مەلائیکەت لە مەسەلەی "جێ‌نشینی"دا بریتی‌یە لە: "عیلم".. پاش ئەوە باسی ڕوودانی شکستی مەلائیکەت لە بەردەم حەزرەتی ئادەمدا دەکات لە کێشەی "عیلم"دا.. پاشان ئەم دوو ڕووداوە بە هێنانی دوو ناوی کوللی لە نێوان ناوە جوانەکانی خوادا کورت دەکاتەوە: ﴿أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ بەو واتایەی کە مەلائیکەتان دەڵێن: ئەی پەروەردگار! هەر خۆت "زانا"یت، ئەوەتا ئادەمت فێری "زانیاری" کرد و بەو زانیاری‌یە سەرکەوت بە سەرماندا.. هەرخۆیشت "دانا"یت، چونکە ئەو شتانەمان پێ دەبەخشیت کە لەگەڵ توانا و لێهاتنماندا گونجاو بێت و، فەزڵی ئادەمیش بە "خۆی و توانا و لێهاتنەکانی"یەوە بەسەرماندا دەدەیت.

یەكێك لە نموونەكانی واتای دووهەمیش، ئەم ئایەتانەیە:

﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَناً خالِصاً سَائِغاً لِلشَّارِبِينَ ۞ وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَراً وَرِزْقاً حَسَناً إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ۞ وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ۞ ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل:٦٦-٦٩).

ئەم ئایەتە پیرۆزانە، ئەوە پێش‌چاو دەخەن كە خواوەند: (مەڕ و بزن و مانگا و حوشتر) و بەدیهاتووانی هاوچەشنی ئەوانی كردووە بە چەند كانی‌یەكی خاوێن و بەلەزەت كە شیریان لێ هەڵدەقوڵێت و.. "ترێ و خورما" و هاوچەشنی ئەوانیشی وەك چەند سینی و دەفرێك لێ كردووە بۆ نیعمەتە ناسك و بەلەزەتەكانی و.. لە شتێكی وەك "هەنگ"یش - كە یەكێكە لە موعجیزاتی توانست - هەنگوینێك دروست دەكات كە وێڕای تامی خۆش و شیرینی‌یەكەی، شیفای دەردی خەڵكیشی تێدایە.. ئنجا لە كۆتایی‌دا، بە ئایەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ مرۆڤ بۆ تێفكرین و پەند وەرگرتن هان دەدەن و، فێری دەكەن كە: قیاسی نیعمەتەكانی تر لەسەر ئەوانە بكات كە باس كران.

◆ **شەشەم سەرنجی ڕەوانبێژی:**

هەندێ جار قورئانی پیرۆز ئەحكامەكانی "پەروەردگاریتی" بەسەر بوونەوەرە زۆر و زەبەندە و فراوانەكاندا بڵاو دەكاتەوە، پاشان نیشانەكانی "یەكبوون"یان لەسەر دادەنێت و لە خاڵی یەكگرتنیاندا - وەك ڕوویەكی یەكێتیی نێوانیان - كۆیان دەكاتەوە.. یان لە دەستوورێكی كوللی‌دا جیایان دەكاتەوە.

بۆ نموونە ئایەتی:

﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّموات وَالأَرْضَ وَلا يَؤُدُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ (البقرة:٢٥٥).

ئەم "ئایەتەلكورسی"یە "دە" ڕستە دەهێنێت كە لە چەند شكڵ و شێوەیەكی جیاوازدا "دە" چینی "تەوحید" دەنوێنن و دەیانچەسپێنن. دوای ئەمانە بە: ﴿مَنْ ذا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ دەماری "شیرك" و دەست تێوەردانی غەیری خوای گەورە، بە تەواوەتی و بەوپەڕی هێز و توانایی دەبچڕێنێت!

جا ئەم ئایەتە لەو ڕووەوە كە "ئیسمی ئەعزەم"ی تێدا درەوشاوەتەوە، واتاكانی لە بارەی ڕاستی‌یە خوایی‌یەكانەوە لە پلە و پایەیەكی یەكجار گەورە و تەواو بەرزدان، چونكە كاروبارە پەروەردگاری‌یەكان لە پلە هەرە مەزنەكانیاندا پیشان دەدات. ئنجا دوای باسكردنی كارسازیی خواوەند كە لە گەورەترین پلە و بەرزترین مەقامدا ئاراستەی

ئاسمانەکان و زەویی دەکات، باسی پارێزگاری(حفیظیـــة)ی ڕەهـا و هەمەلایـەن دەکـات، بـە هـەموو واتاکانیـەوە. ئنجـا لــە پـــەیوەندیدەرێکی یەکخـــەری یـــەکگرتوو و ڕوویـــەکی "یەکبوون"دا سەرچاوەی هەموو ئەو درەوشانەوە مەزنانەش بە: ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ کورت دەکاتەوە!

نموونەیەکی تر:

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّموات وَالأَرْضَ وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَآءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرات رِزْقـــاً لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الأَنْهَارَ ۞ وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّـــمْسَ وَالْقَمَرَ دائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ۞ وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَـتَ اللهِ لا تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ (إبراهيم:٣٢-٣٤).

ئەم ئایەتانە دەری دەخەن کە چۆن خوای گەورە ئەم گەردوونەی لە حوکمی کۆشکێکدا بۆ مرۆڤ بەدی هێنـاوە و.. "ئـاوی" ژیـانی لـە ئاسمانـەوە بـۆ زەوی نـاردووە و.. "زەوی" و "ئاسمان"ی بە وێنەی دوو خزمەتگوزاری کارمەند ملکەچ و گوێڕایەڵ کردووە بۆ مەبەستی گەیاندنی ڕۆزی بە هـەموو خـەڵکی.. هـەروەك "کەشتی"شی بۆ ڕام و گوێڕایـەڵ کـردووە تـاکو دەرفـەت بـە هـەموو کەسـێك بـدات سـوود لـە سـەرجەم بەروبوومــەکانی زەوی وەربگـرێت و، بـەم کـارەش ژیـانی بـۆ مسـۆگەر بکـات و، هـەموو خـەڵکی بـەری ڕەنـج و کۆششیان لەگەڵ یەکدا ئاڵوگۆڕ پێ بکەن..

واتە خوای گەورە چەند شێوە و بارودۆخێکی بە: یەك بە یەکی "دەریا" و "کەشتی" و "با" بەخشـیوە کـە دەڵێـی بـا وەك قـامچی و، کەشـتیش وەك ئەسـپ و، دەریـــاش بــە وێنــەی دەشتاییەکی فـراوان وایـە لـە ژێـر پێـی ئـەو ئەسپەدا! هـەروەك خـوای گـەورە پـەیوەندیی بـۆ مـرۆڤ دروسـت کـردووە لەگـەڵ ئـەو شـتانەی نـاو دنیـادا کـە بـە کەشـتی و هۆکـــارە سروشتییەکانی تـری گواستنەوەی نـاو جۆگـە و ڕووبارەکـان دەگوێزرێنـەوە و.. "خـۆر" و "مانگ"ی بۆ بەگەڕخستووە و کردوونی بە دوو شۆفێری کارگوزار لە بەڕێوەبردنی چـەرخی گــەورەی بوونـــەوەرانی گـــەردوون و، ئامـــادە کردنـی وەرزە جیاوازەکـان و، نیعمەتــە خواییـەکانی ناویـاندا. هـەروەك "شـەو" و "ڕۆژ"ی بـۆ ژێربـار خسـتووە و، شـەوی وەك پۆشـاکێك بـۆ لـێ کـردووە تاکـو تیـایدا بحەوێتـەوە و، ڕۆژیشـی بـۆ کـــردووە بـە کـاتی کەســـابەت و دەستخستنی مایەی ژیان و گوزەرانی..

ئنجا دوای ژماردنی ئەم هەموو نیعمەتـە خواییانە، ئایەتەکە ئەم پوختەیە دەهێنێت کە: ﴿وآتاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللهِ لا تُحْصُوهَـــا﴾ تـاکو مـەودای فراوانیـی بازنـەی نیعمـەت بەخشینەکانی خـوا بەسـەر مرۆڤدا دەربخات و، پیشـانی بـدات کـە چـۆن سەرانسەری ئەو بازنەیە لە نیعمەت پـڕ کـراوە. واتـە هـەر خواستێکی مـرۆڤ کـە چ لـە ڕێـی

پێویستیی سروشتیی خۆی و چ بە زمانی توانا و لێهاتنەکانی لـە خـوا داوای کـردووە، خـوای گـەورە هـەمـوو ئەوانەی پێ بەخشـیوە. خۆ ئەو نیعمەتانەش گـەر بژمـێررێن، ئـەوا هـەر تـەواو نـابن و کۆتاییان پێ نایەت!

بەڵێ، گەر "ئاسمانەکان" و "زەوی" یەکێك بن لە سفرە ڕاخراوەکانی نیعمەتـە مەزنـەکانی خواوەند و، "مانگ" و "خۆر" و "شـەو" و "ڕۆژ"یـش هـەندێك بـن لـە نیعمەتـەکانی سـەر ئـەو سفرەیە، ئەوا بێ هیچ گومانێك دەردەکەوێت کە ئەو نیعمەتانەی ڕوویان لە مرۆڤە هـەرگیزاو هەرگیز تەواو نابن و لە ژماردن نایەن.

◆ **حەوتەم نهێنیی ڕەوانبێژی:**

هەندێ جار قورئان ئامانج و بەروبوومەکانی "بەهۆکراوەکان"(المسبَّبات) بـاس دەکـات، تـاکو "هـۆکار"ە ڕواڵـەتییەکان دابـبڕێت و تـوانـای دروسـتکردن و بەدیهێنـانیان لـێ دابماڵێـت و، بزانرێت کە هۆکارەکان تەنها پەردەیەکی ڕواڵەتین. چونکە "ویستن"ی ئامانجـە پڕ لە دانست و بەروبوومە مەزنەکان، دەبێ هی کەسێك بێت کە خـاوەنی زانسـت و دانسـتی ڕەها بێت، کەچی هۆکارە ڕواڵەتییەکان بێ گیان و هەست و شعوورن! کەواتە ئەو ئایەتە بـە باسکردنی بەر و ئامانجەکانی بەدیهاتووان، ڕایدەگەیەنێت کە: هەرچەند لە ڕواڵـەتدا وا دیـار بێـت کـە "هۆکارەکـان" وابەسـتەی "بـەهۆکراوەکان" بـن، بـەڵام لـە ڕاسـتی و واقیعـدا مەودایەکی یەکجار فراوانیان لە نێواندایە..

بەڵێ، ماوەی نێوان "هۆکار" و "بەدیهێنانی بـەهۆکراوەکان" هێنـدە فراوانـە کـە مـەزنترین "هۆکار" دەستی ناگاتە داوێنی بەدیهێنانی نزمترین "بەهۆکراو". جا لـە ئاسـۆی ئـەم دووریـیە فراوانـەی نێـوان هۆکـار و بـە هۆکراوەکـاندا نـاوە جوانـەکانی خـوا بـە وێنـەی ئەسـتێرە درەخشانەکان هەڵدێن! کەواتە هەڵاتگە(مطلع)ی ئەو ناوانە لەو ماوە مەعنەوییەی نێوان ئەو دوانەدایە! چونکـە هەرچـەند لـە ڕاستیدا ماوەیـەکی دوور لـە نێـوان "ئاسمـان" و "بازنـەی ئاسـۆ"دا هەیـە، کـەچی لـە پێش چاودا وا دەنوێنێـت کـە داوێنـی "ئاسمـان" بەسـەر چیاکـانی دەورانـدەوری ئاسـۆوە بێـت و پێیانـەوە لکـابێت! بـە هـەمان جۆر، مـاوەی مەعنـەویی نێـوان "هۆکار" و "بەهۆکراوەکان"یش هێندە گەورە و فراوانـە کـە مەگـەر بـە دووربینـی "ئیمـان" و نووری "قورئان" ببینرێت! بۆ نموونە:

**﴿فَلْيَنْظُرِ الإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ ۞ أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبّاً ۞ ثُمَّ شَقَقْنَا الأَرْضَ شَقّاً ۞ فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبّاً ۞ وَعِنَباً وَقَضْباً ۞ وَزَيْتُوناً وَنَخلاً ۞ وَحَدَائِقَ غُلْباً ۞ وَفَاكِهَةً وَأَبّاً ۞ مَتَاعاً لَكُمْ وَلأَنْعَامِكُمْ﴾** (عبس:٢٤-٣٢).

ئەم ئایەتە پیرۆزانە، بە شێوەیەکی ڕیزکراوی دانایانە، موعجیزاتی توانستی خوایی باس دەکەن. پاشان لە کۆتاییدا بە وشەی: ﴿مَتَاعاً لَكُمْ وَلأَنْعَامِكُمْ﴾ ئامانجەکەیان بەدەستەوە دەدەن. لەم ئامانجەشدا ئەوە دەچەسپێنێت کە: لە پشت پەردەی سەرجەم "هۆکار" و "بەهۆکراو"ەکانەوە یەکێك هەیە ئەو ئامانجانە دەبینێت و، دەستکارییان دەکات.. هەروەك جەخت لەسەر ئەوەش دەکات کە ئەو هۆکارانە لە پەردەی ڕووی توانستی ئەو کەسە زیاتر هیچی تر نین.

بەڵێ، دەستەواژەی: ﴿مَتَاعاً لَكُمْ وَلأَنْعَامِكُمْ﴾ توانای دروستکردن و بەدیهێنان لە سەرجەم هۆکارەکان دادەماڵێت. چونکە لە واتادا دەڵێت:

ئەو "ئاو"ەی کە لە ئاسمانەوە بۆ ئامادەکردنی ڕۆزیی خۆتان و ئاژەڵەکانتان دەبارێت، هەرگیز لە خۆڕا و بە ویستی خۆی نابارێت، چونکە توانای سۆز و بەزەیی هاتنەوەی بە ئێوە و ئاژەڵەکانتاندا نییە تا بەزەیی پێتاندا بێتەوە. کەواتە ئەو ئاوە بە ناردن لە لایەن یەکێکەوە دەنێررێت..

هەروەها "گڵ"ی بێ هەست و شعووریش لەبەر ئەوەی ناتوانێت بەزەیی بە حاڵتاندا بێتەوە و ڕۆزیتان بۆ ئامادە بکات، ئەوا لە خۆیەوە ڕووەك ناڕوێنێت. بەڵکو کەسێك هەیە درزی پێ دەبات و دەرگاکانی دەکاتەوە و نیعمەتەکانی خۆیتان لەوێوە بەدەست دەگەیەنێت.

"درەخت" و "ڕووەکەکان"یش بە هەمان جۆرن، چونکە تابڵێی دوورن لەوەی کە بەزەییان بە ئێوەدا بێتەوە و بیر لە ڕۆزییەکانتان بکەنەوە و "بەر" و "دانەوێڵە"تان بۆ ئامادە بکەن! بەڵکو ئەوانە لە ڕاستیدا چەند پەت و شریتێکن کە دانایەکی میهرەبان لە پشت پەردەی غەیبەوە شۆڕی کردوونەتەوە و نیعمەتەکانی پێدا هەڵواسیون و بەواندا بۆ زیندەوەرانی ناردوون!

بەم جۆرە و لەم ڕوونکردنەوانەوە هەڵاتگەی گەلێ ناوی جوانی وەك: "الرحيم، الرزاق، المنعم، الكريم" دەردەکەوێت.

نموونەیەکی تر:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللهَ يُزْجِي سَحَاباً ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكاماً فَتَرى الْوَدْقَ يَخرُجُ مِنْ خِلالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ جِبالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشاءُ وَيَصرِفُهُ عَمَّنْ يَشَاءُ يَكادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالأَبْصَارِ ۝ يُقَلِّبُ اللهُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ إِنَّ فِي ذلِكَ لَعِبْرَةً لأُولِي الأَبْصَارِ ۝ وَاللهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِنْ مَاءٍ فَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللهُ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (النور:٤٣-٤٥).

كاتێ ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه كاروباره سه‌رسووڕهێنه‌كانی "هاتنه‌خواره‌وه‌ی باران" و "پێكهاتنی هه‌ور" باس ده‌كات، كه گه‌نجینه‌ی میهره‌بانیی خواوه‌ند و گرنگترین موعجیزه‌ی په‌روه‌ردگاریتین، به جۆرێك لێیان ده‌دوێت ده‌ڵێی به‌شه‌كانی هه‌ور پێشتر هه‌ر به په‌نهانی له‌ناو بۆشایی ئاسماندا بوون و به وێنه‌ی سوپا له كاتی پشوودا بڵاوه‌یان لێ كردووه، به‌ڵام هه‌روه‌ك سه‌ربازه‌كان به ده‌نگی شه‌یپووری سه‌ربازی یه‌كسه‌ری كۆ ده‌بنه‌وه، ئه‌و پارچه هه‌وره بچووكانه‌ش به فه‌رمانی خوای گه‌وره كۆ ده‌بنه‌وه و هه‌ور پێكده‌هێنن و، ئنجا ئه‌و خواوه‌نده‌ش ئاوی مایه‌ی ژیان بۆ سه‌رجه‌م زینده‌وه‌ران له‌و پارچه هه‌ورانه ره‌وانه ده‌كات كه له شێوه و گه‌وره‌یی‌دا له چیا گه‌ڕۆكه‌كانی قیامه‌ت ده‌چن و وه‌ك ته‌رزه و به‌فر سپی و ته‌ڕ و شێ‌دارن. جا له ناردنی ئه‌م ئاوه‌دا "ویست" و "مه‌به‌ست" به جوانی ده‌بینرێت، چونكه ئه‌و ئاوانه به‌پێی پێویست دێن و ده‌بارێن. واته "باران" له خۆڕا نابارێت، به‌ڵكو ده‌نێررێت و له لایه‌نی یه‌كێكه‌وه ره‌وانه ده‌كرێت و، هه‌رگیز ناگونجێ ئه‌و پارچه هه‌وره گه‌ورانه‌ی كه به ئه‌ندازه‌ی چیاكان ده‌بن هه‌ر له خۆیانه‌وه كۆ ببنه‌وه له كاتێكدا كه ڕووی ئاسمان ساماڵ و شین و ورشه‌داره و هیچ په‌ڵه هه‌ورێكی تێدا نی‌یه! به‌ڵكو كه‌سێك ده‌یاننێرێت كه زینده‌وه‌ران ده‌ناسێت و ئاگای له حاڵیانه.

ئا له‌م ماوه مه‌عنه‌وی‌یه‌ش‌دا، هه‌ڵاتگه‌ی ناوه جوانه‌كانی وه‌ك: "القدیر، العلیم، المتصرف، المدبر، المربي، المغیث، المحیي" ده‌رده‌كه‌وێت.

◆ **هه‌شته‌م تایبه‌تكاریی "پاراوی"**:

قورئانی پیرۆز هه‌ندێ له كاره ده‌راسا و ناوازه‌كانی خوای گه‌وره له دنیادا، باس ده‌كات، تاكو زه‌ینه‌كان بۆ ته‌سدیق و دڵانیش بۆ باوه‌ڕكردن ئاماده ببن سه‌باره‌ت به كاره ده‌راساكانی خۆی كه سه‌ر به دواڕۆژن.. یاخود ئه‌و كار و فرمانه خوایی‌یه سه‌رسووڕهێنانه‌ی كه له دواڕۆژ و قیامه‌تدا ڕوو ده‌ده‌ن به جۆرێك باس ده‌كات كه قه‌ناعه‌ت و دڵنیاییمان بداتێ، به‌هۆی ئه‌و هاووێنه زۆرانه‌ی كه له دنیادا ده‌یانبینین. بۆ نموونه:

﴿**أَوَلَمْ يَرَ الإِنسانُ أَنّا خلقناهُ مِنْ نُطفَةٍ فإذا هوَ خصيـــمٌ مبـــين**﴾ تا كۆتایی (سووره‌تی یاسین)، لێره‌دا قورئانی پیرۆز كێشه‌ی حه‌شر به حه‌وت یان هه‌شت شێوه‌ی جیاجیا و جۆراوجۆر ده‌چه‌سپێنێت و به‌ڵگه‌ی له‌سه‌ر ده‌هێنێته‌وه..

له سه‌ره‌تادا "دروستبوونی یه‌كه‌م جار" پێش‌چاو ده‌خات و، ده‌فه‌رموێ: ئه‌وه‌تا به چاوی خۆتان ده‌بینن كه له ئاوی مه‌نی دروست ده‌بن و پاشان ده‌بن به زه‌روو، پاشان به پارچه‌یه‌ك گۆشت و ئنجا به مرۆڤ.. ئیتر چۆن "دروست بوونه‌وه‌ی دووهه‌م جار" به دوور ده‌زانن كه كتومت وه‌ك دروستبوونی یه‌كه‌م وایه ته‌نانه‌ت له‌چاو یه‌كه‌مدا ئاسانتریشه؟..

پاشان به: ﴿**الذي جعلَ لكُمْ منَ الشجَرِ الأَخضَرِ ناراً**﴾ (یس: ٨٠) ئاماژه بۆ ئه‌و چاكه و نیعمه‌ت و به‌خشایشانه ده‌كات كه خواوه‌ندی حه‌ق به‌م مرۆڤه‌ی به‌خشیون. كه‌واته ئه‌و

کەسەی ئەم چەشنە نیعمەتانەی پێ بەخشیون، هەرگیز دەستبەردارتان نابێت تا هەر وا بێ لێپرسینەوە بڕۆنە ناو گۆڕەکانتان و تیایدا بخەون و هەڵنەسنەوە.. پاشان بە هێما دەفەرموێ: ئێوە زیندووکردنەوە و سەوزبوونەوەی درەختە مردووەکان بە چاوی خۆتان دەبینن، ئەدی بۆچی بەلاتانەوە دوورە کە ئەو ئێسکانەی وەك تەختە و داری بێ گیانیان لێ هاتووە ژیانیان تێدا پەیدا ببێتەوە و بۆچی قیاسی ئەو ئێسکانە ناکەنە سەر درەختە مردووەکان؟..

پاشان ئایا دەگونجێ ئەو کەسەی ئاسمانەکان و زەویی بەدی هێناوە، لە زیندووکردنەوە و مراندنی مرۆڤدا - کە بەری درەختی زەوی و ئاسمانەکانە - کۆڵەوار و دەستەوسان بێت؟.. یان ئایا دەگونجێ ئەو کەسەی کە هەموو کارێکی درەخت بەڕێوە ببات و چاودێریی بکات، بەڵام بەری ئەو درەختە پشت گوێ بخات و فەرامۆشی بکات بۆ کەسانی تر؟ ئایا لەو گومانەدان: "درەختی بەدیهاتووان" کە هەموو بەشێکی بە هەویری "دانایی" شێلراوە، بۆ بێ مەبەستی و بێهوودەیی وازی لێ بهێنرێت و دەستی لێ هەڵبگیرێت و بەر و ئەنجامەکانی پشتگوێ بخرێت؟! کەواتە ئەو کەسەی دوایی لە حەشردا زیندووتان دەکاتەوە، هەر ئەو کەسەیە کە کاروباری ئاسمانەکان و زەویی بەدەستە و، سەرجەمی بوونەوەرانیش چەشنی سەربازی گوێڕایەڵ ملکەچی فەرمانی ئەون و، هەموو ئەوانەی بە تەواوەتی و لە ڕێی فەرمانی: ﴿**كُنْ فيكون**﴾ەوە بۆ کار و فرمانەکانی خۆی ژێربار خستووە.. ئەو کەسەی کە بەدیهێنانی بەهاری بەلاوە بە ئەندازەی بەدیهێنانی یەك تاقە گوڵ و دروستکردنی سەرجەمی زیندەوەرانیش بەلای توانستیەوە بە قەدەر دروستکردنی یەك دانە مێش ئاسانە.. جا کەسێ کە خاوەنی توانستێکی وەهابێت هەرگیز پێی ناوترێت: ﴿**مَنْ يُحيِ العظامَ**﴾؟

پاشان بە دەستەواژەی: ﴿**فَسُبحانَ الّذي بيده مَلَكوتُ كلِّ شيء**﴾ (یس:٨٣) دەری دەخات کە: هەر تەنها خوای گەورەیە کاروبار و کلیلی هەموو شتێکی بەدەستە و بەوپەڕی ئاسانیی چەشنی هەڵگێڕانەوەی لاپەڕەی کتێب، شەو و ڕۆژ و زستان و هاوین ئاڵوگۆڕ دەکات و، دنیا و قیامەتیش لای ئەو وەك دوو مەنزڵ وان کە دەرگای یەکێکیان دابخات و ئەوی تریشیان بکاتەوە. جا مادەم وایە، ئەوا ئەنجامی گشت ئەو بەڵگانەی پێشوو بریتییە لە: ﴿**وإليه تُرجَعون**﴾ واتە هەر ئەویشە کە لە گۆڕەکانتاندا زیندووتان دەکاتەوە و بەرەو حەشر دەتانداتەبەر و لە دیوانی خاوێنی خۆیشیدا حسابی خۆتان دەداتێ.

بەم جۆرە، دەبینیت ئەم ئایەتانە (بەوەی کە: هاووێنەی حەشریان لە دنیادا، خستەڕوو) زەین و دڵانیان بۆ وەرگرتنی کێشەی حەشر ئامادە کرد.

هەندێ جاری تریش قورئانی پیرۆز کارە قیامەتییەکان بە شێوەیەك باس دەکات کە چاوی هەستی مرۆڤ بکاتەوە و ئاماژەی بۆ هاوچەشنەکانی ئەو کارە سەر بە قیامەتییانە بۆ بکات کە لە دنیادا هەن تاکو ڕێی ئینکاری کردن لە مرۆڤ بگرێت و بەدوورزانین لە زەینیدا لابدات. بۆ نموونە:

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿إذا الشّمسُ كُوِّرَتْ ❁ وإذا النُّجومُ انكدرَتْ ❁ وإذا الجبالُ سُـيِّرَتْ ❁ وإذا العِشـارُ عُطِّلتْ ❁ وإذا الوحوشُ حُشرَتْ ❁ وإذا البحارُ سُجّرتْ ❁ وإذا النفوسُ زُوِّجـتْ ❁ وإذا المَوؤدةُ سُئلتْ ❁ بأيِّ ذنب قُتِلتْ ❁ وإذا الصُحُفُ نُشِرَتْ ❁ وإذا السَّماءُ كُشِـطتْ ❁ وإذا الجحيمُ سُعِّرَتْ ❁ وإذا الجَنَّةُ أُزْلِفتْ ❁ عَلِمَتْ نَفْسٌ ما أَحضرَتْ﴾ تا كۆتایی سووره‌ته‌كه‌.

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿إذا السّماءُ انفطرتْ ❁ وإذا الكواكبُ انتثرتْ ❁ وإذا البحارُ فُجِّرَتْ ❁ وَإذا القبـورُ بُعثِرتْ ❁ علمتْ نفسٌ ماقَدّمتْ وأَخّرَتْ﴾ تا كۆتایی سووره‌ته‌كه‌.

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿إذا السّماءُ انشقّتْ ❁ وأَذِنَتْ لربّها وحُقّتْ ❁ وإذا الأرضُ مُدَّتْ ❁ وألقَتْ مافيـها وتخلّتْ ❁ وأَذِنَتْ لربّها وحُقّتْ﴾ تا كۆتایی سووره‌ته‌كه‌.

ده‌بینیت ئه‌م سووره‌تانه‌ به‌ ته‌رز و شێوازێك له‌ ئـاڵوگۆڕه‌ مه‌زن و كاروبـاره‌ گـه‌وره‌ په‌روه‌ردگاری‌یه‌كانی سه‌ر به‌ حه‌شر ده‌دوێن كه‌ دڵی مرۆڤ پابـه‌ندی سه‌رسـووڕمانێكی گه‌وره‌ و عه‌قڵیشی گرفتاری سه‌رسامی‌یه‌كی مه‌زن ده‌كه‌ن.. به‌ڵام هـه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی مرۆڤ لـه‌ پایز و به‌هاردا هاووێنه‌ی ئه‌و ڕووداوانه‌ به‌ چاوی خۆی ده‌بینێت، ئه‌وا به‌وپه‌ڕی ئاسانی وه‌ری ده‌گرێت و باوه‌ڕی پێ ده‌كات.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ته‌فسیر كردنی ئه‌م سێ سووره‌ته‌ درێژه‌ ده‌كێشێت، ئه‌وا بۆ نموونه‌ ته‌نها وشه‌ی: ﴿وإذا الصُحفُ نُشِرت﴾ وه‌رده‌گرین و له‌ باره‌یه‌وه‌ ده‌دوێین:

ئه‌م ئایه‌ته‌ ئه‌وه‌ ده‌گه‌یه‌نێ كه‌: له‌ ڕۆژی حه‌شردا هه‌موو كرده‌وه‌كانی مرۆڤ له‌سه‌ر لاپه‌ڕه‌یه‌كدا تۆمار كراون و ده‌خرێنه‌ ڕوو. جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م مه‌سه‌له‌یه‌ شتێكی سه‌یر و سه‌رسووڕهێنه‌ره‌، عه‌قڵ په‌یی پێ نابات. به‌ڵام سووره‌ته‌كه‌ هه‌روه‌ك ئاماژه‌ بۆ حه‌شری به‌هارانه‌ ده‌كات و، هه‌روه‌ك خاڵ و لایه‌نه‌كانی تریش له‌ دنیادا هاووێنه‌یان هه‌یه‌، به‌ هه‌مان جۆر "خستنه‌ڕووی لاپه‌ڕه‌ی كرده‌وه‌كانی مرۆڤیش" هاووێنه‌یان له‌م دنیایه‌دا ئاشكرایه‌، ئه‌وه‌تا هه‌موو: به‌ر و، گیا و، دره‌ختێك خاوه‌نی كرده‌وه‌ و، فه‌رمانبه‌ری و، به‌ندایه‌تی و، ته‌سبیحاتی تایبه‌تیی خۆیانن، به‌ شێوه‌یه‌ك كه‌ ناوه‌ جوانه‌كانی خوای گه‌وره‌یان پێ ده‌ربكه‌وێت. ئنجا سه‌رجه‌می ئه‌م هه‌موو كارانه‌ش له‌گه‌ڵ مێژووی ژیانی ئه‌م به‌ر و گیا و دره‌خته‌دا له‌ یه‌ك‌به‌یه‌كی ناوك و تۆوه‌كانی‌دا تۆماركراون و هه‌ر هه‌موویشیان جارێكی تر له‌ به‌هارێكی تر و جێ‌یه‌كی تردا ده‌رده‌كه‌ونه‌وه‌. واته‌ هه‌روه‌ك یه‌ك‌به‌یه‌كی ئه‌وانه‌ به‌وپه‌ڕی ڕوونی و ڕه‌وانی و به‌ شێوه‌ و شكڵه‌ ڕواڵه‌تی‌یه‌كه‌ی، كاره‌كانی باب و باپیرانی پێشووی ده‌رده‌خات، به‌ هه‌مان جۆر و له‌ ڕێی بڵاوكردنه‌وه‌ی په‌له‌كان و ده‌مكردنه‌وه‌ی گه‌ڵا و به‌ره‌كانی، لاپه‌ڕه‌ی كرداره‌كانی خۆیشی بڵاو ده‌كاته‌وه‌ و ده‌یانخاته‌ ڕوو.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە هەر لە بەرچاوی خۆماندا بەوپەڕی دانایی و، پاریزگاری و، پەروەردەکاری و، نەرمونیانی، ئەم کارە ئەنجام دەدات، هەر ئەویشە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ﴾.

بۆ خۆت بەم چەشنە خاڵەکانی تریش قیاس بکە بۆ سەر ئەمە و، گەر توانا و هێزی هەڵێنجان(استنباط)یشت هەیە، ئەوا فەرموو بۆ خۆت هەڵبگۆزە.

وا بۆ یارمەتیدانت ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾یش باس دەکەین:

وشەی: "كُوِّرَتْ" کە لەم ڕستەیەدا هەیە، واتای: "پێچانەوە" و "کۆکردنەوە" دەگەیەنێت و، نموونەیەکی گەلێ ڕوون و ئاشکرایە. سەرەڕای ئەوەی کە ئاماژە بۆ هاووێنەشی لە دنیادا، دەکات:

یەکەم: خوای گەورە پەردەکانی: نەبوون و، "أثیر" و، ئاسمانی لەسەر گەوهەری ئەو "خۆر"ە لاداوە کە چەشنی چرا دنیای ڕووناك کردووەتەوە و لە گەنجینەی میهرەبانیی خۆیەوە هێناویەتە ئەم دنیایە. جا هەرکات ئەم دنیایە تەواو بوو و دەرگاکانی داخران، ئەوا خواوەند ئەو گەوهەرە بە بەرگەکانی خۆی دەپێچێتەوە و کۆی دەکاتەوە.

دووهەم: "خۆر" کاری ئەوەی پێ سپێرراوە کە بەیانیان تیشکی ڕووناکی بڵاو بکاتەوە و، ئێواران‌یش بیانپێچێتەوە و سەرلەنوێ کۆیان بکاتەوە. بەم چەشنە، شەو و ڕۆژ کارەکانیان بە نۆرە لەسەر زەوی ڕادەپەڕێنن، ئنجا کە لە کارەکانیان بوونەوە شمەك و کەرەسەکانیان کۆ دەکەنەوە. یان لەوانەیە "مانگ" تا ڕادەیەك پەردەیەك بێت بۆ (وەرگرتن و بەخشینەکانی ئەو خۆرە). واتە هەروەك ئەم کارمەندە ئەرك پێ‌سپێرراوە لە ڕێی ئەم هۆیانەوە شمەکەکانی خۆی کۆ دەکاتەوە و دەفتەری تۆماری کارەکانی دەپێچێتەوە، دەبێ بە هەمان جۆریش ڕۆژێك بێتە پێشەوە کە بە تەواوەتی ئەرك و کارمەندی‌یەکانی ئەستۆی تەواو ببن، با هیچ هۆیەکیش بۆ لەکارخستنی لە ئارادا نەبێت.

لەوانەیە ئەو دوو پەڵە بچووکەی کە گەردووونناسان بە ڕووی خۆرەوە دەیبینن و هەردەم لە فراوانبووندان، ئەوە دەربخەن کە: خۆر بە فەرمانی خوای گەورە و لە ڕێی فراوانبوونی ئەو دوو پەڵەیەوە وردە وردە ئەو ڕووناکی‌یەی خۆی کۆ بکاتەوە و بیپێچێتەوە کە بە فەرمانی خوای گەورە بەسەر زەوی‌دا بڵاوی کردبووەوە، ئنجا پەروەردگاری خاوەن عیززەتیش پێی بفەرموێ: (ئالێرەدا کاری تۆ لەگەڵ زەوی‌دا کۆتایی پێ هات.. هەر ئێستا ڕاپەڕە و برۆ بۆ دۆزەخ ئەوانە بسووتێنە کە تۆیان دەپەرست و، کارمەندێکی گوێڕایەڵ و ملکەچی وەك تۆیان بە سووکی سەیر دەکرد و، تۆمەتی خیانەت و بێ‌وەفایی‌یان دەدایە پاڵ)!

بەم شێوەیە "خۆر" فەرمانی پەروەردگاریی: ﴿ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ لەسەر ڕووە پەڵاوی‌یەکەی خۆی دەخوێنێتەوە!

◆ **نۆهه‌م سه‌رنجی ڕه‌وانبێژی:**

هه‌ندێ جار قورئانی پیرۆز چه‌ند مه‌به‌ستێكی "جوزئی" باس ده‌كات. ئنجا بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و مه‌به‌سته جوزئی‌یانه بكات به ده‌ستوورێكی "كوللی" و سه‌رنجی زه‌ینه‌كانی تێدا بگێرێت، ئه‌و مه‌به‌سته جوزئی‌یه ده‌چه‌سپێنێت و به ناوه جوانه‌كانی خواوه‌ند، كه قاعیده‌یه‌كی كوللین، ڕاگیر و قایمیان ده‌كات..

بۆ نموونه:

﴿قَدْ سَمِعَ اللهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللهِ وَاللهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ (المجادلة: ١).

قورئان ده‌فه‌رموێت: خوای گه‌وره خاوه‌نی بیستنی ڕه‌هایه، هه‌موو شتێك ده‌بیستێت، ته‌نانه‌ت به ناوی: "الحق"ی خۆی به‌سه‌رهات و ڕووداوی جوزئیی ئه‌و ئافره‌ته‌ش ده‌بیستێت كه به ناسكترینی دره‌وشانه‌وه‌كانی میهره‌بانیی خواوه‌ند - كه مه‌زنترین گه‌نجینه‌ی سۆز و میهره‌بانی‌یه - به‌هره‌مه‌ند بووه! ئه‌و ده‌عوایه‌ی كه ئافره‌تێك تیای‌دا له‌سه‌ر حه‌ق بووه و له‌سه‌ر مێرده‌كه‌ی به وێنه‌ی سكالاٌ پێشكه‌شی خوای كردووه، خوای گه‌وره به ناوی "الرحیم"ی خۆی و به‌وپه‌ڕی گرنگی و بایه‌خدان به هه‌ر كارێكی گه‌وره، ده‌یبیستێت و، به ناوی "الحق"یشی، به‌وپه‌ڕی جیددی و گه‌رموگوڕی‌یه‌وه بۆی ده‌ڕوانێت و بایه‌خی پێ ده‌دات.

جا بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌م مه‌به‌سته "جوزئی"یه بكرێت به ده‌ستوورێكی "كوللی"، ئه‌وا ئایه‌ته‌كه ده‌ری ده‌خات كه: ئه‌وه‌ی گوێی له بچووكترین ڕووداوی نێوان به‌دیهاتووانه و چاوی لێیه‌تی، ده‌بێ ئه‌و كه‌سه بێت كه هه‌موو شتێك ده‌بیستێ و ده‌بینێت و هه‌رگیز له "مومكینات" ناچێت.. هه‌روه‌ها ئه‌و كه‌سه‌ی كه په‌روه‌ردگاری گه‌ردوون بێت، ده‌بێ سه‌رجه‌م سته‌مكاری‌یه‌كانی ناو گه‌ردوون ببینێت و سكالاٌی سته‌م لێكراوان ببیستێت. چونكه ئه‌و كه‌سه‌ی كه گیروگرفتیان نه‌بینێت و گوێی له داد و فریاد و هاواریان نه‌بێت، هه‌رگیز ناكرێ په‌روه‌ردگاریان بێت!

له‌به‌ر ئه‌وه، ڕسته‌ی: ﴿إِنَّ اللهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ دوو ڕاستیی مه‌زن ده‌رده‌خات. هه‌روه‌ك مه‌به‌سته "جوزئی"یه‌كه‌شی كرد به ده‌ستوورێكی "كوللی".

نموونه‌یه‌كی تر:

﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَا الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ (الإسراء: ١).

قورئانی پیرۆز دوای ئه‌وه‌ی باسی ئیسرای پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستی ﷺ كرد له سه‌ره‌تای میعراجه‌وه - واته له "مسجد الحرام"ه‌وه بۆ "مسجد الاقصی" - تا كۆتایی‌یه‌كه‌ی كه

سوورەی "النجم" ئاماژەی بۆ دەکات، دوای ئەوە، ئەم ئایەتەی سەرەوەی بە ﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ کۆتایی پێ هێنا..

جا ئەو ڕاناوەی کە لە ﴿إِنَّهُ﴾دایە یان بۆ خوای گەورە دەگەڕێتەوە، یان بۆ پێغەمبەری ئازیز ﷺ..

ئەگەر بۆ پێغەمبەر ﷺ بگەڕێتەوە، ئەوا یاساکانی ڕەوانبێژی و موناسەبەتی هاتنی گوفتار ئەوە دەگەیەنن کە: ئەم گەشتە جوزئی‌یەی میعراج هێندە گەشت و گوزار و ڕۆشتنی گشتی و بەرزبوونەوەی کوللیی تێدایە کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی بەرزبوونەوە و دەمی بڕینی پلە هەمەکی‌یەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورەدا، کە تا "سدرة المنتهى" و "قاب قوسين أو أدنى" دەگرنەوە، هەموو نیشانە و بەڵگە پەروەردگاری‌یەکان و گشت ئەو کارە ناوازانەی سنعەتی خواوەندی بیستووە و بینیوە کە لەو گەشتەدا بەر چاو و گوێی کەوتوون. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم گەشتە جوزئی‌یە لە حوکمی کلیلێکدایە بۆ گەشتێکی کوللی و گشتی بە ناو کارە سەرسووڕهێنەکانی سنعەتی خوای گەورەدا[1].

بەڵام ئەگەر ڕاناوەکە بۆ خوای گەورە بگەڕێتەوە، ئەوا ئەو کاتە واتاکەی بەم جۆرە دەبێت:

خوای گەورە بەندە خۆشەویستەکەی بۆ حوزووری خۆی بانگ کردووە، تاکو ئەرکێکی پێ بسپێرێت و کارێکی بخاتە ئەستۆ. بۆیە لە "مسجد الحرام"ەوە شەوڕەویی پێ کرد بەرەو مزگەوتی ئەقصا کە کۆگای پێغەمبەرانە. جا دوای چاوپێکەوتنی پێغەمبەران و ئاشکرا کردنی ئەوەی کە ئەم پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ میراتگری ڕەها و ڕاستەقینەی بناغەی ئایینەکانی هەموو پێغەمبەرانە - درووددیان لەسەر بێت - گەشتێکی بەو پێغەمبەرە خۆشەویستە کرد بۆ ناو مولك و مەلەکووتی خۆی تا گەیاندی‌یە "سدرة المنتهى" و بە ئەندازەی نزیکیی هەردوو سەری کەوانەیەك یان کەمتر، لە خۆی نزیکی خستەوە.

بەم جۆرە ئەم گەشت و سەفەرە هەرچەند میعراجێکی جوزئی بووە و، ئەو کەسەش کە بۆ ئەوێ بەرز کراوەتەوە بەندەیەك بووە لە بەندەکان، بەڵام ئەم بەندەیە "ئەمانەت"ێکی هێندە مەزنی پێ سپێرراوە کە پەیوەندیی بە هەموو گەردوونەوە هەیە و، "نوور"ێکی ڕووناکی‌بەخشی وای لەگەڵدایە کە هەموو بوونەوەران ڕووناك دەکاتەوە و سەروسیمای

(١) لە تەفسیری "روح المعاني"ی "ئالووسی" (ج١٥/ص١٤)دا هاتووە کە:
(ئەگەر وا دابنرێ ڕاناوەکە بۆ پێغەمبەر ﷺ بگەڕێتەوە، وەك "أبو البقاء" لە هەندێکەوە نەقڵی کردووە و وتوویەتی: واتە: بیسەری گوفتارمان و بینەری زاتمانە. چەلەبییش لەمەدا پشتی گرتووە و، وتوویەتی: ئەم بۆچوونە دوور نی‌یە.. ئەوا بەو پێ‌یە، واتاکەی بەم جۆرە دەبێت: ئەو بەندەیەم کە بەم ڕێزلێنانە شەرەفمەندم کردووە شایستەی ئەم ڕێزەیە، چونکە هەر ئەوە کە گوێ‌بیستی فەرمان و نەهی‌یەکانمە و ڕەفتاریان پێ دەکات و، بینەرێکی وەهایشە کە بە چاوی پەند و عیبرەت دەڕوانێتە بوونەوەران و دەرس وەردەگرێت، یان بینەری ئەو نیشانانەیە کە پیشانمان داوە). هەروەها بڕوانە تەفسیری "إسماعيل القنوي" بەسەر "بيضاوي"یەوە ج ٤/ص٢٢٤. (وەرگێڕ)

واتا و ناوەرۆكیان دەگۆڕێت و بەو نووره دەیاننەخشێنێت، جگە لەوەی كە ئەم بەندەیە "كلیل"ێكی ئەوتۆی پێیە كە دەتوانێت دەرگای بەختەوەریی هەمیشەیی و نیعمەتی بەهەشتی هەتاهەتایی پێ بكاتەوە.

لەبەر هەموو ئەمانە، خوای گەورە خۆی بە: ﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ وەسف دەكات، تاكو دەری بخات كە هێندە حیكمەتی بەرز و بڵند لەو "ئەمانەت" و "نوور" و "كلیل"ەدا هەن كە سەرجەمی بوونەوەران و بەدیهاتووان و سەرانسەری گەردوون لە ئامێز دەگرن.

نموونەیەكی تر:

﴿الْحَمْدُ للهِ فَاطِرِ السَّموات والأَرْضِ جَاعِلِ الْمَلائِكَةِ رُسُلاً أُولِي أَجْنِحَةٍ مَثْنى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللهَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (فاطر: ١).

خوای گەورە لەم سوورەتەدا دەفەرموێ: (بەدیهێنەری مەزنی ئاسمانەكان و زەوی، ئەم زەوی و ئاسمانانەی ئارایشت داوە و، ئاسەواری كەمالی خۆی پێش چاوی بینەرانی لەژمارەبەدەر خستووە و، وای لێ كردوون كە هەموویان سوپاس و ستایشی لەژمارەبەدەری پێشكەش بكەن.. هەروەها ئەو بەدیهێنەرە شكۆمەندە بە چەندەها نیعمەتی نەبڕاوە و بێ سنوور زەوی و ئاسمانەكانی ڕازاندووەتەوە، ئەوەتا ئاسمانەكان و زەوی چ بە زمانی نیعمەتەكانیان و چ بە زمانی هەموو نیعمەت‌پێدراوانیش، سوپاس و ستایش پێشكەشی بەدیهێنەری "میهرەبان" دەكەن)..

دوای ئەوە، دەفەرموێ: (ئەو خوایەی كە گەلێ كۆئەندام و باڵی بە مرۆڤ و زیندەوەران و باڵندەكانی سەرزەوی بەخشیوە، تاكو بتوانن فڕین و گەشتوگوزار لە نێوان وڵات و شارەكانی گۆی زەویدا بكەن و.. باڵیشی بە مەلائیكەتانی نیشتەجێی ئەستێرەكان و كۆشكی ئاسمانەكان بەخشیوە، تاكو فڕین و هاتوچۆ بەناو بورجەكانی ئاسمان و مەملەكەتانی بەرز و بڵندی ئەوێدا ئەنجام بدەن.. بێ هیچ گومانێك ئەو خواوەندە، توانای بەسەر هەموو شتێكدا هەیە. كەواتە ئەو كەسەی باڵی بە مێش بەخشیوە تاكو لە بەرێكەوە بۆ بەرێكی تر و، بە چۆلەكەشی داوە تاكو لە درەختێكەوە بۆ درەختێكی تر بفڕن، هەر ئەویشە كە مەلائیكەتانی بە باڵدار دروست كردووە تاكو لە هەسارەی زوهرەوە بۆ موشتەری و لەویشەوە بۆ هەسارەی كەیوان(زحل) بفڕن و گەشتوگوزاریان لە نێواندا بكەن).

پاشان بە دەستەواژەی: ﴿مَثْنى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ﴾ ئاماژە دەكات بۆ ئەوەی كە مەلائیكەتان بە وێنەی سەرنشینانی زەوی لە دۆخێكی جوزئیدا نەبەستراونەتەوە و، پابەندی شوێنی تایبەتی و دیاریكراو نین. بەڵكو دەتوانن لە یەك كاتدا ئامادەی چوار ئەستێرە یان زیاتریش بن.

ئەوەتا ئەم ڕووداوە جوزئییە (واتە باڵداركردنی مەلائیكەت) ئاماژە بۆ گەورەیی توانستی گشتی و ڕەهای خواوەند دەكات و بە پوختەی: ﴿إِنَّ اللهَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ جەخت لەسەر ئەم دەستووره كوللییە دەكات.

◆ **دەهەم سەرنجی ڕەوانبێژی:**

هەندێ جار ئایەتی قورئانی پیرۆز لە تاوان و گوناهەکانی مرۆڤ دەدوێت و، بە توند و تیژی هەڕەشە و سەرزەنشتی ئاراستە دەکات. پاشان ئایەتەکە بە هەندێ لەو ناوە جوانانەی خواوەند کۆتایی پێ دەهێنێت کە ئاماژە بۆ میهرەبانیی خوای گەورە دەکەن، تاکو ئەو سەرزەنشتە توند و تیژە گرفتاری "نائومێدی"ی نەکات!

بۆ نموونە:

**﴿قُلْ لَوْ كانَ مَعَهُ آلِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إذاً لاَبْتَغَوْا إلى ذي الْعَرْشِ سَبيلاً ۞ سُبْحَانَهُ وَتَعَالى عَمّا يَقُولُونَ عُلُوّاً كَبيراً ۞ تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَوات السَّبْعُ والأَرْضُ وَمَنْ فيهِنَّ و إنْ مِنْ شَيْءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لا تَفْقَهُونَ تَسْبيحَهُمْ إنَّهُ كَانَ حَليماً غَفُوراً﴾** (الإسراء:٤٢-٤٤).

دەفەرموێ: (پێیان بڵێ: گەر وەك ئێوە دەڵێن، لەناو موڵکی خوادا هەرکەسێك هەبوایە هاوبەشی ئەو بێت، ئەوا ئەو هاوبەشانە دەستیان دەگەیشتە عەرشی پەروەردگاریتیی خواوەند و ئەو کاتەش بەهۆی تێکچوونی ڕێسای گەردوونەوە نیشانەکانی دەست تێوەردانی ئەو هاوبەشانە دەردەکەوت. کەچی هەموو بوونەوەرانی هەندەکی و هەمەکی و بچووك و گەورە، هەر لە حەوت ئاسمانەکانەوە تا دەگاتە زیندەوەرە میکرۆسکۆبی‌یەکان، بە زمانی دەرکەوتنی درەوشانەوە و نەخش و نیگاری ناوە جوانەکانی خواوەند بە سەریانەوە، تەسبیح و تەقدیسی ئەو خواوەندە شکۆمەند و بەخشندەیە دەکەن کە خاوەنی ئەو ناوانەیە و، تێکڕا خاوێنی و بێ‌هاوبەشیی ئەو ڕادەگەیەنن)!

بەڵێ، "ئاسمان" تەقدیسی ئەو خواوەندە دەکات و بە وشەی ڕووناکی: خۆر و ئەستێرەکانی و، بە زمانی: ڕێکوپێکی و حیکمەتەکانی شایەتی لەسەر "یەکتایی"ی ئەو دەدات و.. "بۆشایی"یە هەواکەشی بە: دەنگی هەور و، وشەی: نەعرەتە و برووسکەکانی و دڵۆپەکانی بارانی، تەسبیح و تەقدیسی ئەو خواوەندە دەکات و شایەتی لەسەر "تەنیایی"یەکەی دەدات.. هەروەك "زەوی" بە وشە زیندووەکانی: زیندەوەران و ڕووەك و بوونەوەرانی ناوی، تەسبیحاتی خوی و "یەکتایی" بەدیهێنەرەکەی ڕادەگەیەنێت.. هەموو "درەخت"ێکی زەویش - بە هەمان جۆر - تەسبیحاتی دەکات و بە وشەی: گەڵا و گوڵ و بەروبوومەکانی شایەتی لەسەر "تەنیایی" ئەو دەدەن.. هەروەها گشت "بەدیهاتوو"یەکی جوزئی و بچووك، وێڕای جوزئی و بچووکیی خۆی، بە ئاماژەکانی ئەو چۆنێتی و نەخش و نیگارانەی پێوەی دیارن و ئەو ناوە جوانە زۆرانەش کە دەریاندەخات، تەسبیح و تەقدیسی خاوەنی ئەو ناوانە دەکات و شایەتی لەسەر "وەحدانییەت"ی دەدات.. بە هەمان جۆر سەرانسەری "گەردوون"یش پێکەوە و بە یەك زمان، تەسبیحاتی بەدیهێنەری شکۆمەندی دەکات و شایەتی لەسەر "یەکتایی" ئەو دەدات، مرۆڤ نەبێ کە پوختە و ئاکام و بەری پێگەیشتوو و جێنشینی ڕێز لێگیراوی ئەو گەردوونەیە، دەچێ بە پێچەوانەی سەرجەم شتانی

ناو گەردوونەوە ڕەفتار دەكات و كافر دەبێت و هاوبەش بۆ خوا دادەنێت! دەسا بزانە ئەم كارەی مرۆڤ چەندە چەپەڵ و ناشیرینە و، دەبێ شایستەی چ سزایەك بێت لەسەر ئەم تاوانە مەزنەی؟..

بەڵام بۆ ئەوەی ئەم مرۆڤە گوناهبارە نەكەوێتە نزمایی و هەڵدێری "نائومێدی"یەوە، ئایەتەكە ئەو حیكمەتەی خواوەندی قەههاری شكۆمەندی بۆ باس دەكات كە خواستی وایە ئەم گەردوونە بەسەر مرۆڤدا نەڕووخێنێت لەسەر ئەم تاوانە یەكجار گەورەیە و، دەفەرموێ: ﴿**إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً**﴾ تاكو بەم پوختە كۆتاییە حیكمەتی مۆڵەتدانی بۆ ڕوون بكاتەوە و دەرگای هیوا و ئومێدی لێ بخاتە سەر پشت!

* * *

دەسا فەرموو بەم: "دە" ئاماژە ئیعجازییانە، لەو بریسكانەوە زۆرانەی ئیعجاز تێبگە كە لە كورتە و پوختەی كۆتایی ئایەتەكاندا هەن، جگە لەو هیدایەت و ڕێنماییە زۆر و زەبەندانەش كە نم نم لێیانەوە دەركەوتوون. تەنانەت كاریگەریی وەهایان لە هەستی ڕەوانگۆیانی وریا و زیرەكدا بەجێهێشتووە كە لەتاو سەرسوورمانیان لە بەردەم ئەم شێوازە ناوازانەدا، وتوویانە: "ئەمە هەرگیز گوفتاری ئادەمیزاد نییە"! هەروەك بە "حق اليقين" ئیمانیان بەم فەرمایشتەی خوای گەورە هێنا كە دەفەرموێ: ﴿**إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحى**﴾!

هەندێ ئایەت هەن، جگە لەم ئاماژانەی باس كران، گەلێ تایبەتكاریی تریان تێدایە كە ئێمە لەم باسەدا لێیان نەدواین. جا لە كۆبوونەوەی سەرجەمی ئەو تایبەتكارییانەوە، نەخشێكی ناوازەی ئیعجاز دەردەكەوێت، كە هێندە ڕوونە تەنانەت كوێرەكانیش دەیبینن!

## نووری سێهەم

### كە بریتییە لەوەی: ئەم قورئانە پیرۆزە لەگەڵ هیچ گوفتارێكی تردا بەراورد ناكرێت

چونكە سەرچاوە و هێز و جوانیی "گوفتار" چوار دانەن:

یەكەم: قسەكەر. دووهەم: قسەبۆكراو. سێهەم: ئامانج. چوارەم: مەقام. كەواتە تەنها "مەقام" نییە وەك ئەو بۆچوونە هەڵەیەی كە ئەدیبان تێی كەوتوون و تیایدا وێڵ بوون!

لەبەر ئەوە، دەبێ لە هەر گوفتارێكدا سەیر بكرێ كە: ئایا كێ وتوویەتی؟.. بە كێی وتووە؟.. بۆچی وتوویەتی؟ لە بارەی چییەوە دواوە؟ كەواتە نەچیت تەنها بۆ "گوفتار"ەكە بڕوانیت و لێی ورد ببیتەوە!

جا مادەم "گوفتار" لەم چوار سەرچاوەیەوە هێز و جوانی بەدەست دەهێنێت، ئەوا كە بە وردی سەیری سەرچاوەكانی قورئان دەكرێت، پەی بە پلەی ڕەوانبێژی و، بەرزی و، جوانییەكەی، دەبرێت!

بەڵێ، گوفتار هێز و تین لە "قسەکەر"ەکەیەوە بەدەست دەهێنێت، بۆ نموونە: گەر ئەو گوفتارە "ئەمر" یان "نەهی" بێت، ئەوا "ویست" و "توانست"ی قسەکەر - بەپێی پلەی هێز و توانستەکەی - لەخۆ دەگرێت و، بە وێنەی تەزووی کارەبا بە ناوی‌دا دەڕوات و هیچ شتێك ڕێی لێ ناگرێت و، کاریگەریی خۆی لە دڵدا بەجێ‌دەهێڵێت. خۆ هەتا ئەو پەیوەندی‌یەش زیاد بکات، هێز و بەرزیی گوفتارەکەش پتر پەرە دەسێنێت و لە زیادبووندا دەبێت. بۆ نموونە:

﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَآءكِ وَيَا سَمَآءُ أَقْلِعِي﴾ (هود: ٤٤).

هەروەها:

﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا أَتَيْنَا طَآئِعِينَ﴾ (فصلت:١١).

دەسا فەرموو سەیری بەرزی و هێزی ئەم فەرمانە حەقیقی‌یە جێ‌بەجێ کراوانە بکە کە "هێز" و "ویست"یان لەخۆ گرتووە.. پاشان سەیری فەرمانی مرۆڤێك بکە، کە بە وێنەی وڕێنەی نەخۆش، بۆ بێ گیانەکانی دەربکات و بڵێت: "أُسكني يا أرضُ وانشقّي يـــا سمـــاءُ وقومي أيتُها القيامة"!

ئایا هەرگیز ئەم گوفتارە لەگەڵ ئەو دوو فەرمانە جێ‌بەجێ کراوانەی پێشوودا بەراورد دەکرێت؟!

پاشان فەرمانی خۆ تێهەڵقورتێنی مرۆڤ لە کوێ، کە لە هەوا و ئاوات و ئارەزووەکانیەوە سەرچاوەی گرتووە و.. ئەو فەرمانانەش لە کوێ کە لە کەسێکەوە دەرچوون خاوەنی سیفەتی "فەرماندەی ڕاستەقینە"یە و بەسەر کارەکانی‌دا زاڵ و بەتوانایە؟

بەڵێ، فەرمانی سەرکردەیەکی قسەڕۆشتوو لە کوێ کە بە سەربازەکانی بڵێت: "پێشکەون.. هەڵمەت‌بەرن".. ئەوەش لە کوێ کە ئەگەر ئەم فەرمانە لە سەربازێکی ئاسایی پشت گوێ خراوەوە دەربچێت؟! خۆ هەرچەند ئەم دوو فەرمانە لە یەك شێوەدان، کەچی لە ناوەرۆکدا مەودایەکی فراوانی بە قەدەر جیاوازیی نێوان "سەرکردەی گشتی" و "سەرباز"یان لە نێواندایە!

نموونەیەکی تر:

﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (يس:٨٢).

هەروەها:

﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ﴾ (البقرة:٣٤).

سەیری هێز و بڵندیی ئەو دوو فەرمانە بکە کە لەم دوو ئایەتەدان و.. ئنجا بۆ ئەو گوفتارانەی ئادەمیزادیش بڕوانە کە لە دەرکردنی فەرمان دەچن! ئایا نابینیت جیاوازیی نێوان هەردوو لا وەك هی ڕووناکیی "گوڵەستێرە" وایە لەچاو ڕووناکیی "خۆر"ی درەخشاندا؟

بەڵێ، لە كوێ گوفتـاری مرۆڤ بەراورد دەكرێت لەگەڵ: نیگاركێشـانی كەسێك لـە دەمی كارەكـەیدا و، ڕوونكردنـەوەی سنعەتیش لـە لایـەن سنعەتكارەوە لـە گەرماو گەرمی سنعەتەكەیدا و، گوفتاری چاكەكارێك لە كاتی چاكـەكاریدا، كە هـەر یەكـەیان شێوەی كارەكەی دەكێشێت و گوفتاری لەگەڵ كـرداریدا یەكاویـەك دەردەچێت؟ واتـە: دەڵێـت: بڕوانن! ئەم كارەم لەبەر فلان شت كرد و، ئەمـەش لەبەر فیسـار دەكەم و، ئەوەش ئاوەهـا و ئاوەها دەبێت و.. هتد. بەم جۆرە كارەكەی لەبەر گوێ و چاواندا بەرجەستە دەكات؟!

بۆ نموونە:

﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَـهَا مِـنْ فُـرُوجٍ ۞ وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ ۞ تَبْصِرَةً وَذِكْرَى لِكُلِّ عَبْدٍ مُنِيبٍ ۞ وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكاً فَأَنْبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ ۞ وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَهَا طَلْـعٌ نَضِيدٌ ۞ رِزْقاً لِلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً كَذَلِكَ الْخُرُوجُ﴾ (ق:٦-١١).

ئـەم نیگاركێشـانەی كـە بـە وێنـەی ئەستێرە لـە بورجی ئـەم سـوورەتە و ئاسمـانی قورئـاندا پرشـنگ دەدات و، دەڵێـی میـوەی بەهەشتە و، لـە نـاوەندی ئـەم كارانـەدا گەلـێ بەڵگـەی هێناوەتەوە و، ڕێكوپێكیی "ڕەوانبێژی"ی خۆیشی پاراستووە و، ئنجا بە تەعبیری: ﴿كَذَلِـكَ الْخُرُوجُ﴾یش "حەشر"ی چەسپاندووە - كە ئەنجامی ئەو كارانەیە - تـاكو ئەو كەسانەی پێ دەمكوت و بێدەنگ بكات كە لە سەرەتای سوورەتەكەدا ئینكاریی حەشریان دەكرد..

بەڵێ، ئەم نیگاركێشانە لـە كوێ و.. ئەو گوفتـارەش لـە كـوێ كە خەڵكی خۆیـانی پێ هەڵدەقورتێنن لەو كارانەدا كە مەگەر بە دەگمەن دەنـا چ پەیوەندییەكی ئەوانی پێوە نییـە؟ دیارە جیاوازیی نێوان ئەم دووانە وەك هی وێنەی گوڵ وایە لەچاو گوڵی زیندووی ڕاستەقینەی خواییدا!

گەر بمانەوێت بە تێر و تەسەلی واتای ئەم ئایەتانە هەر لە: ﴿أَفَلَمْ يَنظُـرُوا﴾ تا ﴿كَذَلِـكَ الْخُـرُوجُ﴾ لێك بدەینەوە، ئەوا پێویستمان بـە كـاتێكی درێژخایـەن دەبێـت، بۆیـە تەنـها ئاماژەیەكیان بۆ دەكەین و بە ڕێی خۆماندا دەڕۆین:

لەبەر ئـەوەی لـە سـەرەتای سـوورەتەكەدا دەری خست كـە كـافران ئینكـاریی حەشریان كردووە، ئەوا قورئانی پیرۆز چەند پێشەكییەك دەخاتـە ڕوو تـاكو بـۆ قبووڵكردنـی "حەشر" ناچاریان بكات. ئەوەتا دەفەرموێ: ئایا سەیری ئاسمان ناكەن بەسەرتانەوە كە چۆن بـە سـام و شكۆ و ڕێكوپێكـی بنیاتمـان نـاوە؟.. ئایـا نـابینن كـە چـۆن بـە ئەسـتێرە و خـۆر و مـانگ ڕازاندوومانەتەوە بێ ئەوەی هیـچ كـەمی و ناتەواوییەكی تێدا ببێت؟.. یـان ئایا نـابینن كە

چۆن زەویمان بۆ تەخت کردوون و بە ڕایەخی حیکمەت بۆمان ڕاخستوون و، چیاکانمان تێدا قایم کردوون تاکو لە بەرزبوونەوە و زاڵبوونی ئاوی دەریاکان بیپارێزن؟.. ئایا نابینن کە لە هەموو ڕەگەزێکی سەوزە و ڕووەکەکان گەلێ نێر و مێی جوان و جۆراوجۆرمان تێدا بەدی هێناوە و سەرانسەری زەویمان پێ ڕازاندووەتەوە؟.. یان ئایا نابینن کە چۆن لە ئاسمانەوە ئاوێکی پیرۆز دەنێرم و، باخ و بێستان و بەروبوومی بەتامی وەك خورما و هاوچەشنی ئەوی پێ دەڕوێنم و دەیانکەم بە ڕۆزیی بەندەکانم؟.. ئایا نابینن کە زەویی وشك و برنگ و مردوو، بەو ئاوە زیندوو دەکەمەوە و هەزاران حەشری دنیایی پێ دەهێنمە کایەوە. جا هەروەك بە توانستی خۆم و لەبەرچاوی خۆتاندا ئەم ڕووەکانە لەو زەوی‌یە مردووە وشك و برنگەدا دەردەهێنم، بە هەمان جۆر لە ڕۆژی حەشردا ئێوەشی لێ دەردەهێنم، چونکە لە قیامەتدا زەوی دەمرێت و ئێوەشی تێدا زیندوو دەکرێنەوە؟!

جا فەرموو بۆ خۆت لێکی بدەرەوە و بزانە کە: ئەو "پاراویی بەیان"ە لە کوێ کە ئەم ئایەتانە لە بواری چەسپاندنی حەشردا دەریانخست، کە ئێمە ئاماژەمان تەنها بۆ یەك لە هەزاری کرد و.. ئەو وشانەش لە کوێ کە خەڵکی لە کێشەکانی خۆیاندا دەیانهێنن و لە سەر یەکتر ڕیزیان دەکەن؟!

* * *

هەر لە سەرەتای ئەم پەیامەوە تا ئێرە، بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوە لە کێشەی ئیعجازدا ڕێبازی "بێ لایەنی مەوزووعی"مان گرتە بەر و، لەم پێناوەدا گەلێ مافی قورئانمان بە پەنهانی هێشتەوە و، لە بەراوردەکاندا ئەو خۆرە تیشك بەخشەمان دەهێنایە ئاستی مۆمەکان، تاکو نەیارێکی سەرسەخت بۆ قبووڵ کردنی ئیعجازی قورئان ناچار بکەین!

ئێستاش کە "لێکۆڵینەوەی زانستی" ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام دا و بە چەشنێکی درەخشان ئیعجازی قورئان چەسپا، وا بە ناوی "حەقیقەت"ەوە، نەك بە ناوی "لێکۆڵینەوەی زانستی" هەندێ ئاماژە بۆ مەقامی قورئان دەکەین کە هێندە گەورەیە لە هیچ بەراورد و هەڵسەنگاندنێکدا جێی نابێتەوە.

بەڵێ، ڕێژەی گوفتارەکانی تر لەچاو ئایەتەکانی قورئاندا وەك ڕێژەی ئەو ئەستێرە یەکجار ورد و بچووکانە وایە کە لە ناو ئاوێنەکاندا دەبینرێن، لە چاو قەبارەی ڕاستەقینەی خودی ئەو ئەستێرانەدا!

بەڵێ، وشەکانی قورئان، کە هەریەکەیان ڕاستی‌یە چەسپاوەکان ڕوون دەکەنەوە، لە کوێ و.. ئەو واتایانەش لە کوێ کە مرۆڤ بە وشەی خۆی لەسەر ئاوێنە بچووکەکانی هەست و بیریدا دەیانەخشێنێت؟

ئه‌و وشه زیندووه خـاوێن و مه‌لائیكـه‌ت ئاسـایانه‌ی قـورئان، كـه گوفتـاری به‌دیهێنـه‌ری خۆر و مـانگن و نووره‌كـانی هیدایـه‌ت پـه‌خش ده‌كـه‌ن، لـه كـوێ و.. ئـه‌و وشـه گه‌زندانـه‌ی مرۆڤیش له كوێ كه به ورده‌كاری‌یه‌كانی خۆیان خه‌ڵكی ده‌خه‌ڵه‌تێنن و، بـه فـوو پێداكردنـی جادووگه‌رانه‌شیان هه‌وا و ئاره‌زووه‌كانیان تێدا ده‌وروژێنن؟

به‌ڵێ، ڕێژه‌ی نێوان مێرووه ژه‌هراوی‌یه‌كان و مه‌لائیكه‌تانی خاوێن و ڕۆحانییانی ڕوونـاك. چه‌نده‌یه.. مه‌ودای نێوان وشه‌كانی مرۆڤ و وشه‌كانی قورئـانی پیرۆزیش بـه هـه‌مان ڕێژه‌یـه. ئه‌م ڕاستی‌یه‌ش هـه‌ر بیسـت و چـوار وتـه‌كانی پێشـوو له‌گـه‌ڵ ئـه‌م وتـه‌ی بیسـت و پێنجه‌مـه‌دا چه‌سپاندوویانن. كه‌واته ئه‌م ده‌عوایه‌مان ئیددیعایه‌كی ڕووت نی‌یه، به‌ڵكو ئه‌نجامی به‌ڵگه‌یه‌كه كه پێشتر هێنراوه و سه‌لمێنراوه!

به‌ڵێ، وشه‌كانی قورئان كه هه‌ریه‌كه‌یان صه‌دده‌فی گه‌لـێ مرواریی هیدایه‌ت و سه‌رچاوه‌ی ڕاستی‌یه‌كانی ئیمان و كانگای بناغه‌كانی ئیسلامن و، له عه‌رشی ڕه‌حـمانه‌وه نـازڵ بـوون و. لـه سه‌روو و ده‌ره‌وه‌ی گه‌ردوونه‌وه ئاراسته‌ی ئاده‌میزاد ده‌كرێن.. ئه‌م گوفتاره ئه‌زه‌لی‌یه‌ی كـه "عیلـم" و "قـودره‌ت" و "ئیراده"ی لـه‌خۆ گرتـووه، لـه‌كوێ و.. وشـه لاوازه پـڕ لـه هـه‌وا و ئاره‌زووه‌كانی مرۆڤیش له كوێ؟!

به‌ڵێ، قورئانی پیرۆز دره‌ختێكی جوانی "توبا" ده‌نوێنێـت كـه لقـه‌كانی بـه هـه‌موو لایـه‌كی جیـهانی ئیسـلامدا بـڵاو كردبێتـه‌وه و، "گـه‌ڵا"ی: سـه‌رجه‌م مه‌عنـه‌وییات و، شـه‌عائیر و. كه‌مالات و، حوكم و، ده‌ستووره‌كانی گرتبێت و، ئه‌ولیا و ئه‌صفیاكانیشـی بـه وێنـه‌ی چـه‌ند "گوڵ"ێكی جـوان و ڕه‌نگین پێش‌چاو خستبێت كه جوانی و پاراوی‌یان لـه ئـاوی ژیـانی دره‌خته‌كه‌وه به‌ده‌ست هێنـابێت و، "بـه‌ر"ی سـه‌رجه‌م كـه‌مالات و ڕاسـتی‌یه گـه‌ردوونی و خوایی‌یه‌كانی گرتبێت، ته‌نانه‌ت هه‌موو یه‌كێكی "ناوك"ی به‌ره‌كانی بووبێـت بـه ده‌ستووری كار و ڕێبازی ژیان..

ئایا ئه‌م زنجیره ڕاستی‌یانه‌ی كه قورئانمان له شێوه‌ی دره‌ختێكی بـه‌رداری خـاوه‌ن سێبه‌ری ئاوادا پیشان ده‌ده‌ن، له كوێ و.. قسه‌ی ئاسایی مرۆڤیش له كوێ؟.. أين الثرى من الثريّا؟!

وا زیاتر له هه‌زار و سێ سه‌د ساڵه قورئـانی حه‌كیم لـه بـازاڕی گـه‌ردوون و پێش‌چاوی سـه‌رجه‌م دانیشـتووانی‌دا، ڕاستی‌یه‌كانی خۆی بـڵاو ده‌كاتـه‌وه و، هـه‌موو كـه‌س و هـه‌موو نـه‌ته‌وه و هه‌موو وڵاتێك به‌شی خۆیان له گه‌وهه‌ر و ڕاستی‌یه‌كانی وه‌رگرتووه و، تـا ئێسـتاش هه‌ر وه‌ری ده‌گرن.. وێڕای هه‌موو ئه‌مانه‌ش، كه‌چی نه ڕاهاتن له‌گه‌ڵی‌دا و نـه ئـه‌و زۆری‌یـه و نه تێپه‌ڕبوونی كات و نه ئاڵوگۆڕه گه‌وره‌كان، هیچیان زیانیان له ڕاستی‌یه به‌نرخه‌كانی و لـه

شـێوازە جوانەکەی نەداوە و پیریان نەکردووە و تەڕی و پاراویی ئەویان لەدەسـت نەداوە و، نەیانتوانیوە لە نرخی دابگرن یاخود تریفەی جوانی‌یەکەی خامۆش بکەن!

ئەم حاڵەتە هەر خۆی لە خۆی‌دا ئیعجازێکی سەربەخۆیە!

خۆ ئەگەر ئێستا کەسێك، بەپێی خواستی هەوا و ئارەزووەکانی و بە هەڵسوکەوتێکی منالانە، بچێت هەندێ لەو ڕاستی‌یانەی کە قورئانی پیرۆز هێناونی، بهۆنێتەوە و، بیەوێت بۆ مەبەستی ئیعتیراز گرتن لە هەندێ ئایەتی قورئان، بەراورد لە نێوان گوفتارەکەی خۆی و گوفتاری قورئاندا ساز بکات و، بڵێت: "ئـەوەتا گوفتارێکی وەك قورئانم وتووە" ئەوا بێ گومان ئەم قسەیەی هێندە نەفامی و گەلحۆیی پێوە دیارە کە کتومت لەم نموونەیەی خوارەوە دەچێت:

بەننایەك کۆشکێکی گەورە بنیات بنێت کە بەردەکانی بریتی بن لە چەند گەوهەرێکی جۆراوجۆر و، هەریەك لەو گەوهەرانەش لە چەند بارودۆخێکی تایبەتی‌دا دابنێت و بە چەند نەخشـونیگارێکی هاوسەنگـی وەها ناوازەش بیانڕازێنێتەوە کـە پەیوەنـدی‌یان بـە هەموو نەخشونیگارە بەرز و ناوازەکانی کۆشکەکەوە ببێت.. پاشان کەسێکی نەشارەزای وا بڕواتە ناو ئەو کۆشکەوە کە هیچ شتێك لەو نەخشونیگارە ناوازانە تێ نەگات و نرخ و بەهای گەوهەر و ئارایشتەکانیشی نەزانێت و، بچێت نەخشونیگار و بارودۆخی بەردەکانی کۆشك بگۆڕێت و بەپێی ئارەزووی خۆی ڕێسایەکی تریان بۆ دابنێت، تا وەك ماڵێکی ئاسایی لـێ بکات و، پاشان بە چەند دەنکە مورووییەکی ئەوتۆ بیڕازێنێتەوە کە تەنها منال بە جوانیان دابنێت و ئنجا بڵێت: خەڵکینە! بڕوانن ئـەوەتا منیش کارامەیی‌یەکی وام لـە هونەری بیناکاری‌دا هەیە کە لە کارامەیی بنیاتنەری ئەو کۆشکە زیاترە و، سامانەکانیشم لـە هی ئەو زۆرترن! وەرن بۆ گەوهەرە بەنرخەکانم بڕوانن!

بێ هیچ گومانێك ئـەم گوفتارە بە "وڕێنە" دادەنرێت، تەنانەت لە وڕێنەی شێتان زیاتر هیچی تری پێ ناوترێت!

# ڕۆشنایی سێهەم

## ئەم ڕۆشنایی‌یە سێ ڕووناکیی پەخش کردووە

### ڕووناکیی یەکەم

لە وتەی سیازدەهەمدا ڕوویەکی مەزنی ئیعجازی قورئان ڕوون کراوەتەوە، وا هێنرایە ئێرە و لەگەڵ ڕووە ئیعجازی‌یەکانی تردا پێش‌چاو خرا:

ئەگەر دەتەوێ بۆخۆت ببینیت و تامی ئەوە بچێژیت کە چۆن هەموو ئایەتێکی قورئانی پیرۆز نووری ئیعجاز و هیدایەتی خۆی بڵاو دەکاتەوە و بە وێنەی ئەستێرەی درەخشان تاریکستانی کوفر دەڕەوێنێتەوە، ئەوا خۆت وا دابنێ کە لەو سەردەمی جاهیلییەت و بیابانی ژیانی دەشتەکی و نەزانی‌یەدا دەژییت کە یەکەم جار قورئانی پیرۆزی تێدا هاتە خوارەوە. دەبینیت: پەردەی بێ‌ئاگایی و، تاریکیی نەزانی و، بەرگی سروشت و، بیری وشك، هەموو شتێکی داپۆشیوە. ئا لەم کاتەدا کە هەموو شتان لەو ڕۆژگارەدا بەم پەردانە داپۆشراون، یەکسەر بەهۆی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە ئەو بوونەوەرە بێ‌هەست و بێ گیان و مردووانە لە زەینی گوێ‌بیستاندا دەبووژێنەوە و ژیانیان بە بەردا دەچێت و بە زایەڵەی ئایەتی: ﴿يُسَبِّحُ لله ما في السَّمـوات وَما في الأرضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزيزِ الْحَكيم﴾ (الجمعة:١) و ئایەتە مەزنەکانی تری هاووێنەی، ڕادەپەڕن و تەسبیح و یادی خواوەند لە ڕووی بوونەوەراندا ڕادەگەیەنن.

هەروەها ڕووی تاریکی ئاسمان، کە چەند ئەستێرەیەکی بێ گیانی تێدا بڵێسە دەدەن، بە زایەڵەی ئایەتی: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمـواتُ السَّبْعُ والأرضُ﴾ (الإسراء:٤٤) لە بەرچاوی گوێ بیستاندا دەبێت بە دەمێکی زیکرخوێن بۆ خوای گەورە و، هەموو ئەستێرەیەکی تیشکی "ڕاستی" دەپرژێنێت و "دانست"ێکی ڕەوان پەخش دەکاتەوە.

هەروەها ڕووی زەوی، کە بوونەوەرە لاواز و دەستەوسانەکانی لەسەر نیشتەجێ بووە، بەو زایەڵە ئاسمانی‌یەی قورئان، لە بەرچاودا دەبێت بە "سەر"ی جەستەی بوونەوەرێکی مەزن و، دەریا و وشکایی‌یەکانیش دەبن بە دوو "زمان"ی دەمپاراو بە زیکر و تەسبیح و ستایشی خواوەند و، سەرجەم ڕووەك و زیندەوەرانیش وەك چەند "وشە"یەکی زیکر و تەسبیح دەردەکەون، دەڵێی سەرجەمی زەوی گیانی بە بەردا کراوە و زیندەوەرێکی خاوەن ژیانە!

ئەگەر بێت و بەم چەشنە، بە هەست و شعووری خۆت، بڕۆیت بۆ ئەو سەردەمەی کە قورئانی پیرۆزی تێدا هاتە خوارەوە، ئەوا وردەکاریی ئیعجاز لەو ئایەتە پیرۆزەدا دەچێژیت. دەنا لە چەشتنی ئەو وردەکارییە نەرمونیانانەی ئایەتەکە بێ بەش دەبیت و پەیی پێ نابەیت!

بەڵێ، گەر لە ناوەندی باری ئێستای خۆتەوە سەیری ئایەتە پیرۆزەکان بکەیت کە بوونەوەران لەو سەردەمەوە تاکو ئێستا بە نووری قورئان ڕووناك بوونەتەوە و سەرجەم زانستە ئیسلامییەکان ڕۆشنایییان پێ بەخشیون، بە ڕادەیەك کە ڕاستییەکان بۆ هەموو کەسێك ئاشکرا بوون و پەردەیان لە ڕوودا هەڵماڵراوە.. واتە ئەگەر لە ڕێی پەردەی ئولفەتەوە سەیری ئایەتە پیرۆزەکان بکەیت، ئەوا بێ گومان مەودای ڕاستەقینەی جوانیی ئیعجاز بەخشی هەموو ئایەتێك بە تەواوی نابینیت و، نازانیت کە هەموو یەکێك لەو ئایەتانە بە ڕووناکییە درەخشانەکەی خۆی چۆن تاریکاییە چڕەکان دەڕەوێنێتەوە. دوای هەموو ئەمانەش لە نێوان ڕووە زۆر و زەبەندەکانی ئیعجازی قورئاندا لە چێژی هەموویان بێبەش دەبیت.

ئەگەر دەتەوێت مەزنترین پلەی ئیعجازە زۆرەکانی قورئان ببینیت، ئەوا گوێ بۆ ئەم نموونەیە ڕابگرە و سەرنجی لێ بدە:

گریمان درەختێکی تابڵێی سەیر و بەرز و سەرسووڕهێنەر و فراوان و بەربڵاو هەبێت، پەردەی غەیبی بەسەردا درابێت..

وەك ئاشکرایە پەل و بەر و گەڵا و گوڵی ئەو درەختە - چەشنی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ - هاوسەنگی و گونجاوی و پەیوەندییان لە نێواندا هەیە و، هەر بەشێك لە بەشەکانی ئەو درەختە بەپێی ماهییەتی درەختەکە شکڵ و شێوەیەکی دیاری کراوی گرتووەتە خۆ..

جا ئەگەر بێت و کەسێك لە لایەنی ئەو درەختە نەبینراوەوە - کە نابینرێت - هات و لەسەر شاشەیەك وێنە و سنووری بۆ هەموو یەکێ لە ئەندامەکانی ئەو درەختە کێشا، بەوەی کە چەند هێڵێکی لەسەر شاشەکە نووسی کە پەیوەندیی نێوان گەڵاکانی ئەو درەختەیان دەنواند و، بە چەند وێنە و هێڵێك کە وێنەی تەواوی ئەندامەکانی درەختەکەیان بەرجەستە دەکرد و وێنەکەیان بە تەواوی دەخستە ڕوو، ماوەی نێوان سەرەتا و کۆتایی -یەکجار لە یەکتر دووری - درەختەکەی پڕ کردەوە.. هیچ گومانێك لەوەدا نامێنێت کە ئەو وێنەکێشە بە ڕوانینی غەیببینی خۆی ئەو درەختە دەبینێت و بە تەواوی ئاگای لێیەتی ئنجا وێنەکەی دەکێشێت.

وەك ئەم نموونەیە، قورئانی پیرۆزیش بە ڕوونکردنەوە ئیعجازبەخشەکانی خۆی کە تایبەتن بە ڕاستیی بوونەوەرانەوە (ئەو ڕاستییەی کە سەر بە درەختی بوونەوەرانە و لە سەرەتای دنیاوە تا کۆتایی ئەودنیا لق و پەلی هاویشتووە و لە زەوییەوە تا عەرش و لە گەردیلەکانەوە

تـا ئەستێرەکان بـڵاو بووەتـەوە) پارێزگـاریی هاوسـەنگی و پێکـەوە گونجـانی بوونـەوەرانی کردووە و، وێنەیەکیشی بە هەموو یەکێ لە ئەندام و بەروبوومەکانی بەخشیوە کە شایستەی بێـت، بە ڕادەیـەك کـە زانـا لێکۆڵـەرەکان لـە دەمـی ئـەنجامدانی لێکۆڵینـەوە و باسـەکانیاندا تووشی سەرسامی و سەرسووڕمان دەبن و دەڵـێن: (مـا شـاء اللّٰه.. بـارك اللّٰه.. ئـەوەی کـە گرێکوێرەی گـەردوون و مەتـەڵی بەدیـهێنان شـی دەکاتـەوە، هـەر تەنـها تـۆی ئـەی قورئـانی پیرۆز)!

بـا ناوەکـانی خـوای گـەورە و سیفەتە مەزنـەکانی و ئیشـە پـەروەردگاری و کـارە پـڕ لـە دانستەکانی، وەك درەختێکی تووبای نوورانی بە نموونە بهێنینەوە کە – وللّٰه المثل الأعلـــى – بازنەی مەزنی‌یەکەی لە ئەزەلەوە تا ئەبـەد و، سنووری گەورەیی‌یەکەشـی فـەزای ڕەهـای بێ سنوور دەگرێتە خۆی و دەورەی دەدات و، مەودای کارەکانیشی لە سنووری: ﴿**فالِقُ الْحَبِّ والنَّوى**﴾ (الأنعام:٩٥) و ﴿**يَحولُ بينَ المرءِ وقَلْبِهِ**﴾ (الأنفال:٢٤) و ﴿**هـــوَ الـــذي يُصَوِّرُكُـــمْ في الأرْحامِ كَيْفَ يَشاءُ**﴾ەوە (آل عمران:٦) تا دەگاتە: ﴿**خَلَقَ السَّمـــــوات والأرْضَ في سِتَّةِ أيّامٍ**﴾ (هــود:٧)و ﴿**والسَّمـــــــواتُ مَطْوِيّـــاتٌ بِيَمينِـــهِ**﴾ (الزمـــر:٦٧) و ﴿**وَسَـــخَّرَ الشَّـــــمْسَ والقَمَرَ**﴾(لقمان:٢٩) دەگرێتەوە.

دەبینین قـورئانی پیرۆز، بەوپەڕی گونجاوی و شـیاوی، ئەو ڕاستی‌یە نوورانی‌یە بـە هـەموو لـق و پەلەکانی و گشت ئامانج و بەروبوومەکانیـەوە ڕوون دەکاتـەوە، بـە ڕادەیـەك کـە هیـچ کـام لـەو ڕاستی‌یانە ڕێ لـە ڕوونکردنـەوەی ڕاسـتی‌یەکی تـر نـاگرێت و حوکمـی هیـچ ڕاستی‌یەکیان هی ئەوانی تر تێك نادات و هیچ کام لەو ڕاستی‌یانەش لەوانی تر تەرە نابێت.

بەم وێنە شایستە و لەگـەڵ یـەك گونجاوانە، قورئـانی پـیرۆز بـە شـێوەیەکی ئیعجـاز بـەخش ڕاستیی ناوەکـانی خـوای گـەورە و سـیفەتە مـەزن و ئیشـە پـەروەردگاری و کـارە پـڕ لـە دانایی‌یـەکانی خواوەنـدی ڕوون کردووەتـەوە، بـە ڕادەیـەك کـە سـەرجەم ئـەهلی کەشـف و ڕاستی و دانسـت و عیرفـانی – کـە بـە نـاو جیـهانی مەلـەکووتدا دەگـەڕێن – خسـتووەتە تەسدیقەوە و، هەموویان بە سەرسووڕمانەوە لە بەردەم ڕوونکردنەوە ئیعجاز بەخشەکانی‌دا دەڵێن: (سـبحان اللّٰه! چەندە ئـەم ڕوونکـردنەوەیە ڕاسـتە و لەگـەڵ حـەقیقەتدا ڕێـك و گـونجاوە و، چەندەش جوان و شایستەیە)!

ئەگەر بە نموونە "شەش پایەکانی ئیمان" بهێنینەوە کە ڕوویان لە هەموو بازنە جیاوازەکانی بوونـەوەران و بازنـەی "وجـوب"ی خـوای گەورەیـە و، بـە پـەلێکی ئـەو دوو درەختـە مەزنـە دادەنرێن، دەبینین قورئانی پیرۆز وێنەی سەرجەم لق و پەل و بەر و گوڵەکانیان دەکێشـێت و، لەمـەشـدا گـونجـاویی نـاوازەی نێـوان بـەر و گـوڵـەکانیان ڕەچـاو دەکـات و، بەوپـەڕی هاوسـەنگی و ڕێکی شێوەکانی پێکەوە گونجانی نێوانیان دەناسێنێت، بە ڕادەیـەك کـە مـرۆڤ

لە بەردەم جوانیی ئەم وێنەکێشانەی قورئاندا سەرسام دەکات و، سەبارەت بە پەی بردن بە دووریەکانیشی گرفتاری سەرسامیی دەکات.

پاشان ئەو "ئیسلام"ەی کە پەلێکە لە لقی "ئیمان"، قورئانی پیرۆز لە باسکردن و وێنەکێشانی وردترین پەلەکانی هەر پێنج پایەکانیدا گەلێ وێنەی ناوازە و سەرسوورهێنی کێشاوە و، جوانیی پێکەوە گونجان و کەمالی هاوسەنگیی نێوانیانی پاراستووە، تەنانەت پارێزگاریی ئاساییترین داب و ئەوپەڕی ئامانج و قووڵترین دانایی و بچووکترین سوود و بەروبوومەکانی کردووە. ڕوونترین بەڵگەش لەسەر ئەم ڕاستییە، کەمالی ڕێکوپێکیی شەریعەتی مەزنە، کە لە دەق و ئاماژە و هێماکانی ئەم قورئانە پیرۆزەوە هەڵقوڵاوە.

جا کەمالی ڕێکوپێکی و.. هاوسەنگیی ورد و.. قەشەنگی و پتەویی پێکەوە گونجانی حوکمەکانی ئەم شەریعەتە خاوێنە.. هەریەکەیان، شایەتێکی دادگەری بێخەوش و بەڵگەیەکی ڕوونی گومانبڕی ئەوتۆن کە هیچ گومانێك هەرگیز توخنیان ناکەوێت لەسەر ئەحەقققیەتی قورئانی پیرۆز. واتە هەرگیز ناکرێ ڕوونکردنەوەکانی قورئان پاڵیان بە زانستێکی جوزئیی مرۆڤێکەوە دابێت، بە تایبەت مرۆڤێکی نەخوێندەوار، بەڵکو دەبێ پاڵیان بە زانستێکی وەها فراوانەوە دابێت کە هەموو شتێك بگرێتەوە و لە یەك کاتدا چاوی لە هەموو شتێکەوە بێت..

کەواتە قورئانی پیرۆز گوفتاری زاتی خواوەندی مەزنە کە لە یەك کاتدا ئەزەل و ئەبەد و سەرجەمی ڕاستییەکان دەبینێت.

آمنا.

## ڕووناکیی دووهەم

"فەلسەفەی مرۆڤ" کە دەیەوێت ڕێ لە حیکمەتی قورئانی پیرۆز بگرێت و بەرەنگاریی بکات، لە بەردەم حیکمەتی بەرز و بڵندی قورئاندا کەوت و شکستی هێنا. وەك بە شێوازی چیرۆکێکی تەمسیلی لە وتەی دوازدەهەمدا ڕوونمان کردووەتەوە و، لە چەند وتەیەکی تریشدا بە جۆرێکی گومانبڕ چەسپاندوومانە. بۆیە خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو پەیامانە دەکەین و، لێرەدا تەنها بەراوردێکی سادە و جوزئی لە نێوانیاندا لە لایەنێکی ترەوە، کە لایەنی ڕوانینی هەردووکیانە بۆ دنیا، بەم شێوەیەی خوارەوە، ساز دەکەین:

فەلسەفە و حیکمەتی مرۆڤ کە دەڕوانێتە دنیا، وەك دنیایەکی بەردەوامی ڕەگداکوتاو بۆی دەڕوانێت! ئەوەتا بە دوور و درێژی لە "ماهییەت" و "تایبەتکارییەکان"ی بوونەوەران دەدوێت، بەڵام گەر ئەو کارمەندی و ئەرکانەی بوونەوەران باس بکات کە بەڵگەن لەسەر بەدیهێنەریان ئەوا بە کورتی و سەرپێیی باسیان دەکات. واتە درێژە بە باسی نەخش و نیگار و پیتەکانی کتێبی گەردوون دەدات، بەڵام بایەخێکی ئەوتۆ بە واتا و ناوەڕۆکەکانیان نادات!

به‌ڵام قورئانی پیرۆز وا ده‌ڕوانێته‌ دنیا كه‌: دنیایه‌كی ڕێبواری به‌خوڕه‌می خه‌ڵه‌تێنه‌ری گه‌ڕۆكی پڕ له‌ ئاڵوگۆڕی ئه‌وتۆیه‌ وه‌ستان و جێگیربوونی بۆ نی‌یه‌! له‌به‌ر ئه‌وه‌، به‌ پوختی و سه‌رپێ‌یی له‌ تایبه‌تكاریی بوونه‌وه‌ران و ماهییه‌ته‌ ماددی و ڕواڵه‌تی‌یه‌كانیان ده‌دوێت، كه‌چی به‌ ته‌واوی درێژه‌ به‌ باسكردنی ئه‌و كار و ئه‌ركانه‌ی بوونه‌وه‌ران ده‌دات كه‌ خواوه‌ند خستوونیه‌ته‌ ئه‌ستۆیانه‌وه‌ و به‌ندایه‌تیی ئه‌وان بۆ خوای گه‌وره‌ ده‌رده‌خه‌ن. هه‌روه‌ك به‌ درێژی له‌ مه‌ودای ملكه‌چ بوونی بوونه‌وه‌رانیش بۆ فه‌رمانه‌ ته‌كوینی‌یه‌كان ده‌دوێت و، ڕوونی ده‌كاته‌وه‌ كه‌ چۆن و له‌ چ ڕوویه‌كه‌وه‌ ده‌بن به‌ به‌ڵگه‌ له‌سه‌ر ناوه‌ جوانه‌كانی به‌دیهێنه‌ریان.

وا له‌م باسه‌ماندا، به‌ په‌له‌، سه‌یرێكی ئه‌و جیاوازی‌یه‌ی نێوان "فه‌لسه‌فه‌" و ڕوانینی "قورئان" ده‌كه‌ین بۆ دنیا و بوونه‌وه‌ران له‌م ڕوانینه‌ كورت و درێژه‌پێدانه‌ی هه‌ردوو لایاندا، تاكو بزانین حه‌ق و ڕاستیی ڕوون و دره‌خشان لای كامیانه‌؟!

كاتژمێره‌كانی ده‌ستمان كه‌ به‌ ڕواڵه‌ت وه‌ستان و نه‌گۆڕانیان پێوه‌ دیاره‌، كه‌چی گه‌لێ له‌ره‌ و ئاڵوگۆڕی جۆراوجۆریان تێدایه‌، چ له‌ جووڵه‌ی به‌رده‌وامی چه‌رخه‌كانی و چ له‌ ڕێی له‌رینه‌وه‌ی به‌ندۆڵ و ئامێره‌ ورده‌كانی..

جا هه‌روه‌ك كاتژمێره‌كانمان به‌م شێوه‌یه‌ن، دنیاش به‌هه‌مان جۆره‌، ده‌ڵێی كاتژمێرێكی مه‌زنه‌ و توانستی خواوه‌ند دایهێناوه‌. خۆ هه‌رچه‌ند به‌ ڕواڵه‌ت نه‌جووڵان و ڕاوه‌ستانی پێوه‌ دیاره‌، كه‌چی له‌ ناوه‌ندی ته‌وژمی نه‌مان و فه‌نادا به‌رده‌وام له‌ ئاڵوگۆڕ و جموجووڵێكی ڕانه‌وه‌ستاودا ته‌پاوتل ده‌دات و تلێر ده‌بێته‌وه‌. چونكه‌ مادده‌م له‌ دنیادا "زه‌مان" هاته‌ گۆڕێ، ئه‌وا "شه‌و و ڕۆژ" وه‌ك چركه‌ژمێرێكی دووسه‌ره‌یان لێ هات بۆ ئه‌و سه‌عاته‌ مه‌زنه‌ و، به‌ خێرایی ده‌جووڵێت و شوێنی ده‌گۆڕێت.. "ساڵ"یش وه‌ك خوله‌ك ژمێر و.. "چه‌رخ"یش به‌ وێنه‌ی میلی سه‌عات ژمێری ئه‌و كاتژمێره‌ مه‌زنه‌یان لێ هات. به‌م جۆره‌ "زه‌مان" دنیای هاویشته‌ سه‌ر پشتی شه‌پۆله‌كانی نه‌مان و فه‌نا و، ته‌نیا كاتی "ئێستا"ی له‌ "بوون"دا هێشته‌وه‌ و، "ڕابوردوو" و "داهاتوو"ی به‌ ده‌ستی عه‌ده‌م سپارد! خۆ جگه‌ له‌م ڕوخساره‌ش كه‌ "زه‌مان" به‌ دنیای به‌خشی، له‌ ڕووی "مه‌كان"یشه‌وه‌ دنیا هه‌روه‌كو كاتژمێرێكی بگۆڕی ڕانه‌وه‌ستاو وایه‌، چونكه‌ "بۆشایی ئاسمان" گه‌ر وه‌ك "مه‌كان"ێك ته‌ماشای بكه‌ین، ده‌بینین هه‌میشه‌ له‌ ئاڵوگۆڕ و جموجووڵی به‌رده‌وامدایه‌، ته‌نانه‌ت كاتی وا هه‌یه‌ له‌ ته‌نها یه‌ك ڕۆژدا چه‌ند جارێك له‌ هه‌ور و باران پڕ ده‌بێت و پاشان سامالێكی خه‌ندان له‌ ڕووی ئاسماندا به‌جێ ده‌هێڵێت. واته‌ "بۆشایی ئاسمان" به‌ خێرایی ئه‌م ئاڵوگۆڕانه‌ی، ده‌ڵێی میلی چركه‌ژمێری ئه‌و كاتژمێره‌ گه‌وره‌یه‌ ده‌نوێنێت..

"ڕوو"ی ئه‌و "زه‌وی"یه‌ش كه‌ ستوونی خانه‌ی دنیایه‌، گه‌ر وه‌ك "مه‌كان"ێك سه‌یری بكه‌ین، ده‌بینین له‌ ڕووی ژیان و مردنی ڕووه‌ك و زینده‌وه‌رانی ناویه‌وه‌، له‌ ئاڵوگۆڕێكی

بەردەوامدایە. کەواتە بە وێنەی میلی "خولەك ژمێر" تێمان دەگەیەنێت کە: ئەم دنیایە ڕێبوارێکی فانی و لەسەر ڕێیە..

خۆ هەروەك ڕووی زەوی لە ئاڵوگۆڕی بەردەوامدایە، ئەوا ئاڵوگۆڕ و بوومەلەرزەکانی "ناوەوە"شی کە بە قوت بوونەوەی چیاکان و نیشتن و ڕۆچوونی زەوی کۆتاییان پێ دێت، کارێکیان کردووە کە "ناوەوە"ی زەوی میلێکی سەعات ژمێری وەها بێت کە هەندێ بە سستی بجوولێت و، لەگەڵ ئەوەشدا پیشانمان بدات کە: ئەم لایەنەی دنیاش بەرەو نەمان دەڕوات..

"ئاسمان"یش کە بنمیچی خانەی دنیایە، گەر وەك "مەکان"ێك بۆی بڕوانین، دەبینین: ئاڵوگۆڕەکانی ناوی، چەشنی: جموجوولی تەنە ئاسمانییەکان یان دەرکەوتنی کلکدارەکان و گیرانی خۆر و مانگ و کەوتنی ئەستێرە و تیرەستێرە و، ئاڵوگۆڕەکانی تری وەك ئەمانە، بۆمان دەردەخەن کە: "ئاسمان"یش بەهەمان جۆر ڕاوەستاو و چەسپاو نییە، بەڵکو بەرەو پیری و دارمان دەڕوات، ئەوەتا ئاڵوگۆڕەکانی کە وەك میلە حەفتە ژمێرەکانی سەعات وان و بە سستی دەجوولێن، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە: بەرەو ڕووخان و نەمان دەڕوات!

بەم جۆرە، دنیا لە خۆیدا (واتە لەو ڕووەوە کە دنیایە) لەسەر ئەم حەوت پایەیە بنیات نراوە کە هەموو کات و ساتێك دەجوولێن و بوومەلەرزەی تێدا دروست دەکەن. بەڵام هەر ئەم دنیا بزۆکەی کە هەمیشە لە ئاڵوگۆڕی بەردەوامدایە، کاتێ ڕوو دەکاتە بەدیهێنەری شکۆمەندی خۆی، ئەوا ئەو ئاڵوگۆڕ و جموجووڵانە دەبن بە: جووڵەی قەڵەمی توانستی خوایی لە کاتی نووسینی نامە صەمەدانییەکانی لەسەر لاپەڕەی "وجوود"دا و.. ئاڵوگۆڕی بارودۆخەکانی دنیاش دەبن بە: چەند ئاوێنەیەکی نوێ و یەك لە دوای یەکی ئەوتۆ کە نوورەکانی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانیان تێدا دەردەکەوێت و کاروبارە سەرتاپا حیکمەتەکانی ئەو ناوە جوانانە دەردەخەن و بە چەند وەسفێکی جۆراوجۆری شایستەش وەسفی ئەو خواوەندە دەکەن.

بەم جۆرە دەرکەوت کە "دنیا" لە خۆیدا ڕووی لە فەنا و نەمانە و، بە چوستی و خێرایی بەرەو وێرانی و نەمان دەڕوات و، بە بەردەوامی لە ئاڵوگۆڕ و جموجووڵدایە. کەواتە دنیا – لە ڕاستیدا – وەك ئاوی بەخوڕ وایە کە دەڕوات و وەستانی نییە. بەڵام "بێئاگایی مرۆڤ" لە خواوەندی خۆی، ئەو ئاوە بەخوڕەی بە وشك و وەستاو پیشانی مرۆڤ دا و، بەهۆی چەمکی ماددیی "سروشت"یش ئاوەکە لێڵ بوو و خاوێنییەکەی لەدەست دا. تا لە ئەنجامدا دنیا بوو بە پەردەیەکی چڕی سەهۆڵ ئاسای هێندە ئەستوور کە بەری قیامەتی لە مرۆڤ گرت!

جا فه‌لسه‌فه‌ی نه‌خۆش، به‌ ورده‌كاری و لێكگه‌ڕانه‌ فه‌لسه‌فی‌یه‌كانی و.. له‌ ڕێی چه‌مكی ماددیی سروشته‌وه‌ و.. به‌ هۆكاری لایه‌نه‌ خه‌ڵه‌تێنه‌ره‌كان و به‌ره‌ڵایی و هه‌وه‌سبازی‌یه‌كانی شارستانێتیی له‌ خشته‌به‌ری نه‌فام.. چرپی زیاتری، به‌و په‌رده‌یه‌ی دنیا داوه‌ و پتر سه‌خت و ڕه‌قی كردووه‌ و، خه‌وی قوڵتری غه‌فڵه‌تی له‌ مرۆڤ خستووه‌ و، به‌ چه‌نده‌ها قات په‌ره‌ی به‌ چڵك و چه‌په‌ڵی‌یه‌كانیشی داوه‌. تا له‌ ئه‌نجامدا: "كردگاری شكۆمه‌ند" و "ئاخیره‌تی گه‌ش و خه‌ندان"ی له‌ بیری مرۆڤ برده‌وه‌!

به‌ڵام "قورئانی پیرۆز" هێنده‌ به‌ توندی ئه‌م دنیایه‌ - كه‌ ئه‌مه‌ ناوه‌رۆكیه‌تی و له‌و ڕووه‌وه‌ كه‌ دنیایه‌ - ڕاده‌ته‌كێنێت تا له‌ ئه‌نجامدا وه‌ك خوریی شی كراوه‌ی لێ ده‌كات! بڕوانه‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿الْقَارِعَةُ ۞ مَا الْقَارِعَةُ﴾ و ﴿إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ﴾ و ﴿وَالطُّورِ ۞ وَكِتَابٍ مَّسْطُورٍ﴾ و ئایه‌ته‌كانی تری هاوچه‌شنیان!

پاشان قورئان، ڕوونی و خاوێنی‌یه‌كی سازگار به‌ دنیا ده‌به‌خشێت و، خڵته‌ و لێڵی‌یه‌كانی به‌م ڕوونكردنه‌وه‌ ڕه‌نگینانه‌ی خۆی لێ لا ده‌بات وه‌ك: ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّموات والأَرْضِ﴾ (الأعراف:١٨٥) هه‌روه‌ها: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا﴾ (ق:٦) هه‌روه‌ها: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّموات والأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً﴾(الأنبياء:٣٠) هه‌روه‌ها ئایه‌ته‌ حه‌كیمه‌كانی تری وه‌ك ئه‌مانه‌..

پاشان ئه‌و دنیایه‌ی كه‌ به‌ ڕوانینی غه‌فڵه‌ت و بێئاگایی مرۆڤ له‌ خوا، وه‌كو سه‌هۆڵ به‌ستوویه‌تی، قورئانی پیرۆز به‌ گوفتاره‌ نوورانی و ورشه‌داره‌كانی خۆی ده‌یتوێنێته‌وه‌، وه‌ك: ﴿اللهُ نُورُ السَّموات والأَرْضِ﴾ و ﴿وَمَا الْحيوةُ الدُّنْيَا إِلاَّ لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾ هه‌روه‌ها ئایه‌ته‌ مه‌زنه‌كانی تری هاوچه‌شنیان..

پاشان قورئان وه‌همی "ئه‌به‌دییه‌ت" و "نه‌مریی مرۆڤ له‌ دنیادا" به‌و ده‌سته‌واژانه‌ی خۆی له‌ ئه‌ندێشه‌ی مرۆڤدا لا ده‌بات كه‌ هه‌واڵی نه‌مان و مردنی دنیا ڕاده‌گه‌یه‌نن. وه‌ك: ﴿ إِذَا السَّمَاءُ انْفَطَرَتْ...﴾ و ﴿ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ...﴾ و ﴿ إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ...﴾ و ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّموات وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللهُ...﴾ و ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌كانی تری هاوچه‌شنیان.

پاشان ئه‌و غه‌فڵه‌ته‌ی كه‌ چه‌مكی ماددیی "سروشت"ی به‌رهه‌م هێناوه‌، قورئانی پیرۆز به‌ بانگه‌ بروسكه‌ ئاساكانی خۆی ده‌یڕه‌وێنێته‌وه‌ و نایهێڵێت. وه‌ك له‌م ئایه‌تانه‌ی: ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (الحديد:٤) و ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ للهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (النمل:٩٣) و ئایه‌ته‌ ڕووناكه‌كانی تری هاوچه‌شنیاندا ده‌رده‌كه‌وێت.

بەم جۆرە، قورئانی پیرۆز بە گشت ئایەتە گەردوونی‌یەکانی (واتە ئەوانەیان کە ڕوویان لە گەردوونە) لەسەر ئەم بناغەیە دەڕوات و بەردەوام دەبێت، تا ڕووی ڕاستەقینەی دنیا وەك خۆی دەردەخات و دەیخاتە پێش‌چاو. هەروەك بەو ئایەتانە ڕووی ناشیرین و چەپەڵی دنیاش دەردەخات و، لەم ڕێیەوە ڕوانینی مرۆڤ لەو ڕووە ناشیرینەی دنیاوە بۆ ڕووە جوانەکەی وەردەچەرخێنێت کە بۆ بەدیهێنەری شکۆمەند دەڕوانێت! بەم کارەش دەرسی حیکمەتی دروست و فەلسەفەی ڕاستی پێ دەڵێتەوە و لە واتاکانی کتێبی گەورەی گەردوونی دەگەیەنێت و، لە هەمان کاتدا ئاوڕ لە پیت و نەخش و نیگارەکانیشی دەداتەوە، بەڵام بێ ئەوەی کار و ڕەنجی خۆی لەو لایەنە فانی‌یانەی نەخشی پیتەکاندا بە فیڕۆ بدات کە پەیوەندی‌یان بە مرۆڤەوە نی‌یە، وەك ئەوەی فەلسەفەی مەست و شەیدای "ناشیرینی" دەیکات، کە - بەم کارەی - سەیرکردنی واتا و ناوەڕۆکی ئەم کتێبەی گەردوونی لە بیری مرۆڤ بردووەتەوە!

## ڕووناکیی سێهەم

لە ڕووناکیی دووهەمدا ئاماژەمان بۆ ڕووخان و تێکشکانی حیکمەتی مرۆڤ کرد لە بەردەم حیکمەتی قورئاندا، هەروەك ئاماژەشمان تێدا کرد بۆ ئیعجازی حیکمەتی قورئان.

وا لەم ڕووناکی‌یەشدا پلەی حیکمەتی قوتابییانی قورئان (کە زانایانی ئەصفیا و، ئەولیایانی پیاوچاك و، کەسانی ڕووناکبووی ناو حەکیمە ئیشراقی‌یەکانن)[1] لەچاو حیکمەتی قورئاندا ڕوون دەکەینەوە و، بە پوختی ئاماژە بۆ ئەم لایەنەی ئیعجازی قورئان دەکەین.

ڕاستترین و ڕوونترین بەڵگە لەسەر پایەبڵندیی قورئانی حەکیم و لەسەر ئەوەی کە قورئان ڕاست و ڕەوایە و، بەهێزترین بەڵگە و نیشانەش لەسەر ئیعجازەکەی ئەوەیە کە:

قورئانی پیرۆز لە دەمی باسکردنی "تەوحید" و هەموو بەشەکانی‌دا هاودەم لەگەڵ باسکردنی گشت پلەکانی ئەو بەشانە و سەرجەم پێداویستی‌یەکانیان و، بێ ئەوەش "ڕێکوپێکی"ی هیچ کامێکیان تێك بدات، بە تەواوی "هاوسەنگی"ی خۆی پاراستووە! هەروەك پارێزگاریی "هاوسەنگی"ی نێوان گشت حەقیقەتە خوایی‌یە بەرزەکانیشی کردووە و، سەرجەمی ئەو حوکمانەشی لە خۆدا کۆکردووەتەوە کە هەموو ناوە جوانەکانی خوای گەورە داخوازی دەبن، هاودەم لەگەڵ پاراستنی ڕێکوپێکی و پەیوەندیی دەست

(١) ئیشراقی‌یەکان چەند فەیلەسووفێکی صۆفی بوون، بەڵام چەند ڕا و بۆچوونێکیان بووە کە لەگەڵ ئیسلامدا یەك ناگرێت و ڕێڕەوەکەیان ئاوێتەیەکە لە فەلسەفەی ئەفلاتوونیی نوێ و ئاینی ئیسلام. (وەرگێڕ)

له‌ملانی نێوان ئه‌و حوكمانه‌دا.. هه‌روه‌ك به‌ هاوسه‌نگیی ته‌واو كاروباری "ڕبووبییه‌ت" و "ئولوهییه‌ت"یشی پێكه‌وه‌ له‌ خۆدا كۆكردووه‌ته‌وه‌!

جا ئه‌م "پارێزگاری" و "هاوسه‌نگی" و "كۆكردنه‌وه‌"یه‌، تایبه‌تكاریی‌یه‌كی قورئانه‌ كه‌ هه‌رگیز له‌ هیچ ئاسه‌وارێكی مرۆڤدا نی‌یه‌. ته‌نانه‌ت نه‌ له‌ به‌رهه‌مه‌ فیكری‌یه‌كانی گشت بیریاره‌ مه‌زنه‌كان و، نه‌ له‌ ئاسه‌واری ئه‌ولیایانی پیاوچاكدا كه‌ ڕۆشتوونه‌ته‌ ناو جیهانی مه‌له‌كووت و، نه‌ له‌ كتێبی ئه‌و ئیشراقی‌یانه‌ی كه‌ له‌ ناخی دیوی ناوه‌وه‌ی شتاندا ڕۆچوون و، نه‌ له‌ عیرفانی ئه‌و ڕۆحانی‌یانه‌شدا كه‌ ڕۆشتوونه‌ته‌ ناو جیهانی په‌نهانی غه‌یبه‌وه‌، تایبه‌تكاریی وا ده‌ست ناكه‌وێت. به‌ڵكو هه‌موو به‌ش و تاقمێكی ئه‌وان ده‌ستی به‌ ته‌نها لقێك یان دوو لقی دره‌خته‌ مه‌زنه‌كه‌ی "حه‌قیقه‌ت"ه‌وه‌ گرتووه‌ و، به‌ ته‌واوه‌تی به‌ گه‌ڵا و به‌ری ئه‌و لقه‌وه‌ سه‌رقاڵ بووه‌ و، چ له‌به‌ر پێ‌نه‌زانی و چ له‌به‌ر بۆ نه‌ڕوانین، ئاوڕی له‌ هیچ كامی لقه‌كانی تر نه‌داوه‌ته‌وه‌، ده‌ڵێی جۆره‌ كار دابه‌شكردنێك له‌ نێوانیاندا ڕووی داوه‌!

به‌ڵێ، ڕوانینه‌ "به‌رته‌سكه‌ پابه‌نده‌كان" هه‌رگیز ناتوانن ده‌ورانده‌وری "حه‌قیقه‌تی ڕه‌ها" بده‌ن و هه‌موو لایه‌كی ببینن. چونكه‌ ئه‌م كاره‌ پێویستی به‌ ڕوانینێكی كوللی و گشتگیری وه‌ك "قورئانی پیرۆز" ده‌بێت!

كه‌واته‌ هیچ شتێكی تری غه‌یری قورئانی پیرۆز - با ده‌رس و ڕێنماییشی له‌ قورئان وه‌رگرتبێت - ناتوانێت به‌ "ژیری"یه‌ سنووردار و جوزئی‌یه‌كه‌ی خۆی جگه‌ له‌ چمكێك یان دوو چمكی حه‌قیقه‌ته‌ كامڵه‌كه‌ زیاتر هیچی تر به‌ ته‌واوی ببینێت! بۆیه‌ به‌ گه‌رموگوڕی له‌و چمك و لایه‌نه‌دا سه‌رقاڵ ده‌بێت و لێی ناترازێت و، له‌ ئه‌نجامدا "هاوسه‌نگی"ی نێوان "حه‌قیقه‌ته‌كان" ده‌شێوێنێت و، یان به‌ "ئیفراط" یاخود "ته‌فریط" ڕێكوپێكیی نێوانیان ناهێڵێت!

له‌ لقی دووهه‌می وته‌ی بیست و چواره‌مدا به‌ نموونه‌یه‌كی سه‌یر ئه‌م ڕاستی‌یه‌مان ڕوون كردووه‌ته‌وه‌. به‌ڵام لێره‌دا نموونه‌یه‌كی تر ده‌هێنینه‌وه‌ كه‌ ئاماژه‌ بۆ خودی ئه‌م مه‌سه‌له‌یه‌ ده‌كات. ئه‌مه‌ش نموونه‌كه‌یه‌:

گریمان له‌ بنكی ده‌ریایه‌كی فراواندا گه‌نجینه‌یه‌كی گه‌وره‌ی پڕ له‌ گه‌وهه‌ری به‌نرخ ببێت. ئنجا چه‌ند مه‌له‌وانێكی بن‌ده‌ریایی كارامه‌ بۆ دۆزینه‌وه‌ی گه‌وهه‌ره‌كانی ئه‌و گه‌نجینه‌ به‌نرخه‌ ڕۆشتبنه‌ ناو ئه‌و ده‌ریایه‌وه‌. به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی چاویان به‌سترابوو، ئه‌وا مه‌گه‌ر به‌ ده‌ست، ده‌نا نه‌یانده‌توانی جۆره‌كانی ئه‌و گه‌وهه‌ره‌ به‌نرخانه‌ بناسنه‌وه‌. یه‌كێكیان ده‌ستی به‌ر ئه‌ڵماسێكی كه‌مێك درێژ كه‌وت و، بڕیاری دا كه‌ ئه‌و گه‌نجینه‌یه‌ بریتی‌یه‌ له‌: گه‌نجینه‌یه‌كی پڕ له‌ شیشی ئه‌ڵماس! خۆ كه‌ وه‌سفی چه‌ند گه‌وهه‌رێكی تری له‌ هاوه‌ڵه‌كانی بیست، پێی وابوو ئه‌و گه‌وهه‌رانه‌ی كه‌ ئه‌وان لێی ده‌دوێن شوێنكه‌وته‌ و نقێم و نه‌خش و نیگاری ئه‌و شیشه‌ ئه‌ڵماسانه‌ن كه‌ خۆی دۆزیونیه‌ته‌وه‌! هه‌روه‌ها گریمان هه‌ندێكی تریان شتێكی خڕی وه‌ك

یـاقووت و.. کەسـانێکی تریـان مورروویـەکی زەردووی چوار گۆشـەیان دۆزیبێتـەوە و.. بـەم جۆرە... هتد.. ئەوا هەموو یەکێ لەوانەی کە ئەو گەوهەر و بەردە گرانبەهایانەیان بە دەست - نەك بە چاو - دیوە، پێی وا دەبێت: ئەو گەوهـەرە بەنرخـەی کـە خـۆی دۆزیویەتـەوە بەشـی "سـەرەکی" و "زۆر"ی گەنجینەکـە پێکدەهێنێـت و، ئـەو وەسـفانەش کـە لـە هاورێکـانی دەبیستێت بە لق و پەل و ناو کارەی گەنجینەکەیان دادەنێت، نەك بەشـێکی "سـەرەکی"ی ئەو گەنجینەیە!

بەم جـۆرە ، "هاوسـەنگی"ی ڕاستییەکان دەشـێوێت و "ڕێکوپێکـی"یەکـەی نێوانیشـیان نامێنێت و، ڕەنگ و ڕوخساری گەلێ حەقیقەتیش دەگۆڕێت. چونکە ئەو کەسەی دەیەوێت ڕەنگی ڕاستەقینەی "حەقیقەت" ببینێت ناچاری گەلێ تەئویل و تەکەللوفی خۆکـرد دەبێـت. تەنانەت ئەم کارە هەندێك لەوانە بۆ هەڵدێری "ئینکـار" و "تـەعطیل" ڕادەکێشێت! خـۆ هـەر کەس بە وردی سەرنج لە کتێبـی حەکیمـە ئیشـراقییەکان و ئـەو صۆفیانـەش بـدات کـە تەنـها پشتیان بە "مەشهوودات" و "کەشفییات"ی خۆیان بەستووە و ئەمانەشیان بـە تـەرازووەکانی سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ هەڵنەسەنگاندووە، بێ هیچ دوودڵییەك تەسـدیقی ئـەم بڕیـارەی ئێمە دەکات.

کەواتە هەرچەند ئەوانە لە قورئانـەوە ڕێنمـایی وەردەگـرن و، لـە هـەمان ڕەگـەز و جـۆری ڕاستییەکانی قورئـاندا کتێبـەکانیان دادەنێن، کـەچی هەمیشـە کـەمی و ناتـەواوی ئاوێتـەی بەرهەمەکانیانە، چونکە هیچ کامیان "قورئان" نین!

بەڵام "قورئانی پیرۆز" دەریای ڕاستییەکانە و، ئایەتە مەزنەکانیشی مەلەوانی ناو بنکی ئەو دەریایەن. ئـەوەتا گەنجینەکـەی نـاوی دەدۆزنـەوە و دەیناسێنن و لـە بارەیـەوە دەدوێـن.. بـەڵام دەبێ بزانـین کـە: ئـەمان چاویـان کراوەیـە و سـەرجەم و سەرانسـەری گەوهـەرەکانی نـاو گەنجینەکـە دەبینـن! بۆیـە "قورئـانی پـیرۆز" لـە ڕێـی ئایەتـە مەزنەکانیـەوە، وەسـفێکی "هاوسـەنگ" و "بۆگـونجاو"ی ئـەو گـەنجینە گەورەیـە دەکـات و، بـەم کارەشـی جـوانیی ڕاسـتەقینە و سەرنج ڕاکێشی خۆی دەردەخات!

* بۆ نموونە:

قورئانی پیرۆز "گەورەیی پەروەردگاریتی"یە شکۆمەندەکەی خوای گەورە دەبینێـت و بـە واتاکانی ئەم ئایەتە پیرۆزانە وەسفی دەکات:

**﴿وَالأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ وَالسَّموَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾** (الزمر:٦٧)، **﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾** (الأنبيـاء:١٠٤). لـە هـەمان کاتیشـدا و بـە بەڵگـەی ئـەم ئایەتـە پیرۆزانە، هەمەلایەنیی میهرەبانیی خواوەند دەبینێت: **﴿إِنَّ اللهَ لا يَخْفى عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلا فِي السَّمَاءِ ۞ هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ﴾** (آل عمران:٥-٦)، **﴿مَا مِنْ دابَّةٍ**

إلاّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا﴾(هـــود:٥٦)، ﴿وَكَـــأَيِّنْ مِـــنْ دَابَّـــةٍ لا تَحْمِـــلُ رِزْقَـــهَا اللهُ يَرْزُقُـــهَا وَإِيَّاكُمْ﴾(العنكبوت:٦٠).

پاشان هەروەك فراوانیی "خەللاقییەت"ی خواوەند دەبینێت و ئەم ئایەتە پیرۆزەی لەسەر دەكات بە بەڵگە و لە ڕێیەوە دەری دەبڕێت: ﴿خَلَقَ السَّموات وَالأَرْضَ وَجَعَـــلَ الظُّلُمَـــاتِ وَالنُّورَ﴾ (الأنعام:١) بە هەمان جۆر، شمووڵی دەست وەردانی خواوەند لە كاروباری هەموو گەردووندا و هەمەلایەنگیریی پەروەردگاریتی‌یەكەشی بۆ هەموو شتێك، دەبینێت و بەپێی ڕوونكردنەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕێنمایی خەڵكی بۆ لا دەكات: ﴿خَلَقَكُـــــمْ وَمَـــا تَعْمَلُونَ﴾(الصافات:٩٦).

پاشان هەروەك ئەو ڕاستی‌یە مەزنە دەبینێت كە ئەم ئایەتە دەری دەخات: ﴿يُحْـــيِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ (الـــروم:٥٠) بە هەمان جۆر، ڕاستیی ئەو بەخشـــندەیی و كـــەرەمە فراوانەش دەبینێت و دەبێ بە بەڵگە لەسەری كە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەری دەبڕێت: ﴿وَأَوْحى رَبُّـــكَ إلى النَّحْلِ﴾(النحـــل:٦٨) و، لە هەمان كاتیشدا و بە ڕێنمایی ئەم ئایەتە پیرۆزە حەقیقەتی ئەو فەرمانڕەوایەتی‌یە زاڵ و هەمەلایەنگیرەش دەبینێت: ﴿وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُجُومَ مُسَـــخَّراتٍ بِأَمْرِه﴾ (الأعراف:٥٤)..

پاشان هەروەك ئەو ڕاستی‌یە بەسۆز و كارسازەی ئەم ئایەتە دەبینێت: ﴿أَوَلَـــمْ يَـــرَوْا إلى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إلاّ الرَّحْـــمنُ إنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصيرٌ﴾ (الملـــك:١٩) بە هەمان جۆر، حەقیقەتی یەكجار مەزنی ئەم ئایەتەش دەبینێت: ﴿وَسِـــعَ كُرْسِـــيُّهُ السَّـــمواتِ وَالأَرْضَ وَلا يَؤُدُهُ حِفْظُـــهُمَا...﴾ (البقـــرة:٢٥٥).. هەر لە هەمان كاتیشدا حەقیقەتی ئەو چاودێری‌یە خوایی‌یەش دەبینێت كە لە دەربڕینی ئەم ئایەتەدایە: ﴿وَهُـــوَ مَعَكُـــمْ أَيْـــنَ مَـــا كُنْتُمْ﴾(الحديد:٤) بە وێنەی بینینی ئەو ڕاستی‌یە گشتگیرەی كە ئەم ئایەتە دەری دەبڕێت: ﴿هُـــوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَليمٌ﴾ (الحديـد:٣).. هەروەها ئەو نزیكی‌یەی خواوەندیش دەبینێت كە ئەم ئایەتە دەری بڕیوە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإنْسانَ وَ نَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِـــهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ (ق:١٦) لەگەڵ ئەو ڕاستی‌یە بەرزەش كە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ دەكات: ﴿تَعْرُجُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ إلَيْهِ في يَوْمٍ كَانَ مِقْدارُهُ خَمْسينَ أَلْـــفَ سَنَةٍ﴾ (المعارج:٤) بە وێنەی بینینی ئەو ڕاستی‌یە هەمەلایەنەیەی كە ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەری: ﴿ إنَّ اللهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإحْسَانِ وَإيتَاءِ ذي الْقُرْبى وَيَنْهى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَـــرِ وَالْبَغْيِ﴾ (النحل:٩٠)..

هەروەها ئایەتە پیرۆزەکانی تری وەك ئەمانەش، کە دەستووورە دنیایی و قیامەتی و عیلمی و عەمەلی‌یەکانیان لەخۆ گرتووە.

کەواتە "قورئان" هەموو ئەو دەستوورانەی کە بەختەوەریی هەردوو ژیان دەهێننەدی، دەبینێت و لێیان دەدوێت و ڕوونیان دەکاتەوە، هەروەك هەموو یەکێ لە شەش پایەکانی ئیمان و پێنج پایەکانی ئیسلام بە دوور و درێژی یەکالا دەکاتەوە و بە جیددی و گەرموگوڕی و ئامانجداری دەیانخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و، لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاریی "هاوسەنگی"ی نێوانیان دەکات و "پێکەوەگونجان"ی نێوانیشیان وەك خۆی دەهێڵێتەوە. ئنجا لە سەرچاوەی ئەم جوانی‌یە ناوازەیەی کە لە "پێکەوەگونجان" و "هاوسەنگی"ی هەموو ئەم ڕاستی‌یانەوە پەیدا بووە، ئیعجازێکی مەعنەویی ڕەنگین بۆ قورئانی پیرۆز سەر هەڵدەدات!

لەم نهێنی‌یەوە دەردەکەوێت کە: زانایانی کەلام، هەرچەندەش قوتابێتیی قورئانیان کردووە و هەزاران کتێبیان داناوە کە هەندێکیان دەیان بەرگ دەبن، کەچی لەبەر ئەوەی بە وێنەی دەستەی "موعتەزیلە" تەرجیحی عەقڵیان بەسەر "نەقڵ"دا داوە، ئەوا نەیانتوانیوە هێندەی "دە" ئایەتی قورئانی پیرۆز ڕاستی‌یەکانی ئیمان ڕوون بکەنەوە و بە جۆرێکی دڵنیاکەر و قەناعەتبەخش و گومانبڕ بیانچەسپێنن! چونکە ئەوان لە بناری چیا دوورەکانەوە کانیاو هەڵدەکەنن و ئنجا بە لوولە و کارێز (واتە بە زنجیرەی هۆکارەکان) لەوپەڕی جیهانەوە ئاو ڕادەکێشن، ئنجا دێن لەوێدا زنجیرەکە دەقرتێنن و "بوون" و "ناسین"ی خواوەندی "واجب الوجود" دەچەسپێنن، کە وەکو ئاوی ژیانبەخش وایە!.. بەلام هەریەك لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان بە وێنەی عەساکەی حەزرەتی مووسا وایە، لە هەر شوێنێکدا بیەوێت دەیدات بە زەوی‌دا و کانیاو دەتەقێنێتەوە و، لە هەموو شتێکیشدا پەنجەرەیەك دەکاتەوە کە لێیەوە دەڕوانرێتە کردگاری شکۆمەند و دەیناسێنێت! ئەم ڕاستی‌یەش لە هەموو وتەکاندا و، لە پەیامی عەرەبیی "قطرة"شدا کە دڵۆپێکی نمنم داچۆڕاوی دەریای قورئانە، بە ڕوونی چەسپێنراوە.

هەر لەم نهێنی‌یەشەوەیە کە دەبینین گشت پێشەوایانی دەستە و کۆمەڵە گومڕاکان، لەوانەی کە بە ناو ناخی شتاندا ڕۆچوون و بێ شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ پشتیان بە "مەشهوودات"ی خۆیان بەست و، لە ڕێگادا گەڕانەوە و، دەستە و تاقمێکی گومڕایان پێکهێنا و سەرکردەیی کۆمەڵێکیان گرتە ئەستۆ.. هەموو ئەوانە، پێیان بەرەو ئەم چەشنە بیدعەت و گومڕایی‌یانە ترازا و، مرۆڤایەتی‌یان بۆ لای ئەم جۆرە ڕێگە وێڵانە دایەبەر، چونکە نەیانتوانی پارێزگاریی "ڕێکوپێکی" و "هاوسەنگی"ی ڕاستی‌یەکان بکەن!

جا دەستەوسانی و کۆڵەواریی هەموو ئەوانە، ئیعجازێکی تری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەردەخات!

# كۆتایی

له نمی چوارده‌هه‌می "وته‌ی نۆزده‌هه‌م"دا دوو دانه لـه بریسـكانه‌وه‌كانی ئیعجـازی قورئـان رابورد، كه بریتین له: حیكمه‌تی دووپات بوونه‌وه لـه قورئـاندا و، حیكمـه‌تی پوختـه لێدوانـی قورئان له بواری زانسته گه‌ردوونی‌یه‌كاندا.

لـه‌و وته‌یـه‌دا بـه ڕوونـی ده‌ركـه‌وت كـه هـه‌ر یـه‌ك لـه‌م دوانـه یـه‌كێكن لـه سـه‌رچاوه‌كانی ئیعجازی قورئان، به پێچه‌وانه‌ی گومانی هه‌ندێ كه‌س كه پێیان وایه مایه‌ی كـه‌موكوورین لـه قورئاندا.. هه‌روه‌ك له مه‌قامی دووهه‌می "وته‌ی بیسته‌م"یشدا بریسكه‌یه‌كی ئیعجـازی قورئـان بـه جوانـی ڕوون كرایـه‌وه، كـه به‌سـه‌ر ڕووی موعجیزاتی پێغه‌مبه‌رانـه‌وه – علیـهم السـلام – ده‌دره‌وشـێته‌وه. جگـه له‌مـانه، گه‌لــێ بریسـكه‌ی تـری ئیعجـازی وه‌ك ئه‌مانـه لـه هـه‌موو "وته‌كان" و په‌یامه عه‌ره‌بی‌یه‌كانمدا باس كراون، بۆیه به‌وانه واز ده‌هێنـین. بـه‌ڵام لـێره‌دا هێنـده ده‌ڵێین كه:

موعجیزه‌یه‌كی تری قورئان بریتی‌یه له‌وه‌ی:

هه‌روه‌ك هه‌موو موعجیزاتی پێغه‌مبه‌ران – علیهم السلام – به كۆمـه‌ڵی و پێكـه‌وه یـه‌كێك لـه نه‌خش و نیگاره‌كانی ئیعجازی قورئانیان ده‌رخست، به هه‌مان جـۆر قورئـانیش بـه هـه‌موو موعجیزه‌كانیـه‌وه، موعجـیزه گه‌وره‌كـه‌ی پێغه‌مبـه‌ر ﷺ ده‌رده‌خـات! هــه‌روه‌ك سـه‌رجه‌م موعجـیزاتی پێغه‌مبـه‌ریش ﷺ بـه موعجیزه‌یـه‌كی قورئـانی پـیرۆز داده‌نرێـت! چونكـه ئـه‌و موعجیزانه ئاماژه بۆ ئه‌وه ده‌كه‌ن كه قورئان هی خوای گه‌وره‌یه، واته گوفتاری ئـه‌وه. جـا بـه ده‌ركـه‌وتنی ئـه‌م نیسبه‌تدانه‌ی قورئـان بـۆ لای خـوای گـه‌وره، هـه‌موو یـه‌كێك لـه وشـه‌كانی قورئان ده‌بێت به موعجیزه‌یه‌كی سه‌ربه‌خۆ، چونكه ئه‌و كاته هـه‌موو یـه‌كێك لـه‌و وشـانه وه‌ك ناوك ده‌بن و ده‌گونجێ له واتادا دره‌ختێكی ته‌واوی "حه‌قیقه‌ت" له‌خۆ بگرن و، بـه وێنـه‌ی دڵ له‌ناو جه‌سته‌دا ئـه‌وانیش په‌یوه‌ندی‌یان له‌گـه‌ڵ سـه‌رجه‌م ئه‌ندامـه‌كانی حه‌قیقـه‌تی هه‌ره‌مـه‌زندا ببێت و به پیت و ڕوخسار و چۆنێتی و ڕێ و شوێنیشیان ڕوویـان لـه چه‌نده‌ها كاروبـاری لـه سنوور بـه‌ده‌ر بێـت، چونكـه هه‌ریه‌كـه‌یان پـاڵی بـه زانسـتێكی گشـتگیر و ویسـتێكی بـێ كۆتایی‌یه‌وه داوه!

ئا لێرەوەیە کە زانایانی "پیتزانی"(علم الحروف) دەڵێن: (لە تەنها یەك پیتی قورئاندا پڕ بە لاپەڕەیەکی تەواو نهێنیمان دەرهێناوە) و، ئەم دەعوایەشیان بە بەڵگەوە بۆ کەسانی شارەزای ئەو بوارە دەچەسپێنن.

ئێستاش بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەرەوە کە لە سەرەتای ئەم پەیامەوە تا ئێرە، باس کراون و بە چاویلکەی هەموو ئەو: ڕۆشنایی و، تیشك و، بریسکە و، نوور و، ڕووناکی‌یانەی لەم پەیامەدان، سەیری ئەنجامی ئەو دەعوایە بکە کە لە سەرەتای پەیامەکەدا کردمان. دەبینیت ئەم پەیامە بە هەموو هێزێکی خۆی دەنگی لێ هەڵبڕیوە و، ئەو "ئەنجام"ە دەخوێنێتەوە و ڕایدەگەیەنێت، کە:

**﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنْسُ والْجِنُّ علَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هذا القُرْآنِ لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً﴾!**

**﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعليمُ الْحَكيمُ﴾.**

**﴿رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾.**

**﴿رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ۞ وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي ۞ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسَانِي ۞ يَفْقَهُوا قَوْلِي﴾.**

اللهمّ صلِّ وسلِّمْ أفضل وأجمل وأنبل وأظهر وأطهر وأحسن وأبرَّ وأكرم وأعزَّ وأعظم وأشرف وأعلى وأزكى وأبركَ وألطف صلواتِكَ.. وأوفى وأكثرَ وأزيد وأرقى وأرفعَ وأدوم سلامِكَ.. صلاة وسلاماً، ورحمة ورِضواناً، وعفواً وغُفراناً، تمتدُّ وتزيد بوابِلِ سحائب مواهبِ جودِكَ وكرمِكَ، وتنمو وتزكو بنفائسِ شرائفِ لطائفِ جودِكَ ومِنَنِكَ، أزليّةً بأزليتكَ لا تزول، أبديّةً بأبديّتِكَ لا تحول.. على عبدِكَ وحبيبك ورسولكَ محمد خير خلقك: النور الباهر اللامع، والبرهان الظاهر القاطع، والبحر الزاخر، والنور الغامر، والجمال الزاهر، والجلال القاهر، والكمال الفاخر.. صلاتَكَ الّتي صلّيتَ بعظمةِ ذاتِكَ عليه وعلى آله وأصحابه كذلك، صلاةً تغفر بها ذنوبنا، وتشرح بها صدورنا، وتطهر بها قلوبنا وتُرَوِّحُ بها أرواحنا، وتُقَدِّسُ بها أسرارَنا، وتنزِّهُ بها خواطرنا وأفكارنا، وتصفّي بها كدورات ما في أسرارنا وتشفي بها أمراضنا، وتفتح بها أقفال قلوبنا.

**﴿رَبَّنَا لا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾.**

**﴿وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لله رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾.**

آمين.. آمين.. آمين.

# پاشكۆی یەكەم

**ئەم پاشكۆیە پلەی حەڤدەهەمی تیشكی حەوتەمە (الآية الكبرى) كرا به پاشكۆیەك بۆ وتەی بیست و پێنجەم**

ئەم گەشتیارەی كە تێر نابێت و ماندووبوون كاری تێناكات، زانیی: ئامانجی ژیانی ئەم دنیایە و ژیانی "ژیان" تەنها لە ئیماندایە، بۆیە لەگەڵ "دڵ"ی خۆیدا دوا و وتی:

- گوفتاری ئەو كەسەی كە لێی دەگەڕێین، بەناوبانگترین و ڕاست و داناترین گوفتاری ناو ئەم "بوون"ەیە و، لە هەموو چەرخ و سەردەمێكدا تەحەددای گشت ئەوانەی كردووە كە ملی بۆ كەچ ناكەن. كەواتە با لە پێشدا سەر لەو قورئانە پیرۆزە خاوەن ڕەوانییە ئیعجازبەخشە بدەین و بزانین چی دەڵێت؟ بەڵام پێش ئەوەی بچینە ناو ئەم جیهانە جوانەوە، با هەندێك بووەستین و ئەوەندە لەم كتێبە بكۆڵینەوە كە دڵنیامان بكات لەوەی كتێبی بەدیهێنەری ئێمەیە.

بەم جۆرە، دەستی كرد بە وردبوونەوە و لێكۆڵینەوە.

جا لەبەر ئەوەی ئەم گەشتیارە لە هاوچەرخەكانمانە، ئەوا لە پێشدا سەیری "پەیامەكانی نوور"ی كرد، كە چەند بریسكانەوەیەكی ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆزن، بینیی:

ئەم پەیامانەی كە دەگەنە سەد و سی دانە، بۆخۆیان تەفسیرێكی بەنرخی ئایەتەكانی قورئانن، چونكە پەردە لە ڕووی سەرنجە وردەكان و ڕووناكییە ڕەنگینەكانی ئەو ئایەتانەی قورئان لادەدەن و ئاشكرایان دەكەن.

خۆ هەرچەندەش "پەیامەكانی نوور" لەم سەردەمە مولحیدە سەرسەختەدا، بە جیهاد و تێكۆشانێكی بەردەوام، ڕاستییەكانی قورئانیان بە هەموو لایەكدا بڵاو كردووەتەوە، كەچی هیچ كەسێك نەیتوانیوە ڕەخنەیان لێ بگرێت یان ڕووبەڕوویان بێتەوە، ئەمەش ئەوە دەچەسپێنێت كە قورئانی پیرۆز - كە پێشەوا و ڕابەر و سەرچاوە و خۆری ڕووناكی بەخشی ئەو پەیامانەیە - ئاسمانییە و، گوفتاری خواوەندی پەروەردگاری هەموو جیهانەكانە و، هەرگیز گوفتاری ئادەمیزاد نییە، بە ڕادەیەك كە "وتەی بیست و پێنجەم" و كۆتایی "مەكتووبی نۆزدەهەم" كە هەردووكیان تەنها یەك بەڵگەی نێوان سەدان بەڵگەن لەوانەی كە پەیامەكانی نوور بۆ ڕوونكردنەوەی ئیعجازی قورئان هێناونی، بە چل شێوە و ڕووی جۆراوجۆر ئیعجازی قورئانیان چەسپاندووە، بە چەشنێك هەموو ئەو كەسانەیان خستووەتە

سەرسوورمانەوە کە خوێندوونیانەتەوە و لێیان کۆڵیونەتەوە، پاشان ڕێز و سەرسوورمانی خۆیان بەرامبەر بەو پەیامانە دەربڕیوە، چ جای ئەوەی کە ڕەخنەیان ئاراستە بکەن یان بەرەنگاریان بنەوە، بەڵکو هەموویان - تێکڕا - ستایشیان کردوون.

جا چەسپاندنی ڕووی ئیعجازی قورئان و، خستنەڕووی ئەو لایەنەی کە دەری دەخات قورئان فەرمایشت و گوفتاری خواوەندە، ئەم گەشتیارە بە پەیامەکانی نووری سپاردن، بەڵام بە وردی سەرنجی لە چەند خاڵێکدا کە بە ئاماژەیەکی کورت **مەزنی قورئانی پیرۆز** دەردەخەن:

● **خاڵی یەکەم:**

هەروەك قورئانی پیرۆز، بە هەموو موعجیزات و ڕاستییەکانی خۆی، کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی لە هەموو شتێکی تر حەقترن، موعجیزەی حەزرەتی محەممەدە ﷺ، بە هەمان جۆر حەزرەتی محەممەدیش ﷺ بە هەموو موعجیزەکانی و بەڵگەکانی پێغەمبەریتی و کەماڵاتی زانیاریی خۆی، موعجیزەی قورئانی پیرۆزە و، بەڵگەیەکی گومان بڕە لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز گوفتاری خواوەندی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

● **خاڵی دووەم:**

قورئانی پیرۆز گۆڕانکارییەکی گەلێ مەزنی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هێنایە گۆڕێ و، ڕووناکیی بە هەموو ئاسۆکانی گەردووندا پەخشاند و پڕی کردن لە بەختەوەری و ڕاستییە مەزنەکانی لەسەر نەخشاندن و، ئاڵوگۆڕێکی یەکجار گەورەی ئەنجام دا چ لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا چ لە گیان و ژیرییاندا چ لە ژیانی: کەسی و کۆمەڵایەتی و ڕامیارییاندا. ئنجا ئەم گۆڕان و ئاڵوگۆڕەشی بە بەردەوامی هێشتەوە و بەڕێوەی برد، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە ئایەتەکانی ئەم قورئانە (کە دەگەنە شەش هەزار و شەش سەد و شەست و شەش ئایەت) وا چواردە سەدەی ڕەبەقە لە هەموو چرکەیەکدا بە لای کەمەوە لەسەر زاری زیاتر لە سەد ملیۆن کەس، بەوپەڕی ڕێز و شکۆدارییەوە دەخوێندرێنەوە و، لەو کاتەیشەوە ئەم قورئانە خەڵکان پەروەردە و "دەروونەکان"یشیان پاکژ دەکات و، "دڵانیان" دەپاڵێوێت و، ڕوونی و پلەبەرزی بە "گیانیان" و، ڕاستەشەقام و ڕووناکیش بە "ژیرییان" و ژین و بەختەوەریش بە "ژیانیان" دەبەخشێت.. بێ هیچ گومانێك، ئەم کتێبە هیچ هاووێنە و هاوتا و هاوشانێکی نییە، کەواتە موعجیزە و دەراسایە.

● **خاڵی سێهەم:**

قورئانی پیرۆز هەر لەو سەردەمەوە تاکو ئێستا ڕەوانبێژییەکی وای پیشان داوە کە لە وێنەی نییە. بە ڕادەیەك کە نرخی "موعەللەقاتی سەبعە"ی بەناوبانگی ئەوانی داگرتە خوار

كه چه‌ند پارچه شیعرێكی كه‌ڵه شاعیره هه‌ره ڕه‌وانگۆكانیان بوون و به زێـڕ نوسـرابوون و بـه دیـواری كه‌عبـه‌دا هه‌ڵواسـرابوون، بـه ڕاده و ئه‌ندازه‌یـه‌كی ئـه‌وتۆ لـه شـان و شـكۆ و نـرخ و به‌های داشكاندن كه دوای هاتنی قورئان، كچه‌كه‌ی "لوبه‌ید" پارچه شـیعره‌كه‌ی بـاوكی لـه ڕووی دیواری كه‌عبه داگرت و، وتی:

(مادهم ئه‌م ئایه‌تانه هاتن، ئیتر جێی تۆ لێره‌دا نه‌ماوه)!

هه‌روه‌ها كاتێك ئه‌دیبێكی ده‌شته‌كی ئه‌م ئایه‌ته‌ی بیست كه ده‌فه‌رموێ:

﴿فاصْدَعْ بما تُؤْمَر﴾ (الحجر:٩٤) خۆی پێ ڕانه‌گیرا و یه‌كسه‌ر سه‌ری سوژده‌ی نایه زه‌وی! پێیان وت:

ئایا موسڵمان بوویت؟

وتی:

نه‌خێر.. به‌ڵام سوژده‌م بۆ ڕه‌وانبێژیی ئه‌م ئایه‌ته برد!

هـه‌روه‌ها هـه‌زاران كـه‌س لـه پێشـه‌وایانی ڕه‌وانبێـژی و كه‌ڵـه ئـه‌دیبانی چه‌شـنی: عـه‌بدولقاهیری جورجـانی و، سه‌ككاكی و، زومه‌خشـه‌ری، بـه یـه‌ك ده‌م و یـه‌ك ده‌نـگ دان به‌وه‌دا ده‌نێن كه:

(ڕه‌وانبێژیی قورئان له سه‌رووی وزه‌ی مرۆڤه‌وه‌یه و، له توانای هیـچ كه‌سێكدا نی‌یـه پێـی بگات).

هه‌روه‌ها قورئانی پیرۆز، هه‌ر لـه كـاتی نـازڵ بوونیـه‌وه تـاكو ئێسـتاش، ته‌حـه‌ددای هـه‌موو ڕه‌وانبێژ و ئـه‌دیبه له‌خۆبایی و سـه‌رسـه‌خته‌كان ده‌كـات و، لـه كـه‌ش و فـش و خۆبه‌گـه‌وره گـرتـن و سـه‌رسه‌ختی‌یان داده‌گرێـت و لووتبـه‌رزی‌یان ده‌هێنێتـه خـوار و، لـه‌و ته‌حه‌ددایانه‌شدا داوای هێنانی سووره‌تێكی وه‌ك سـووره‌ته‌كانی قورئانیـان لـێ ده‌كـات، یـان ده‌بێت به تیاچوون و ڕسوایی دنیا و قیامه‌ت ڕازی بن..

ئا لـه‌م كاتـه‌دا كـه قورئـان ئـه‌م ته‌حه‌ددایـه‌ی ڕاده‌گه‌یـه‌نێت، ده‌بینیـت سـه‌رجه‌م ڕه‌وانبێـژه سـه‌رسـه‌خته‌كانی ئـه‌و سـه‌رده‌مه وازیـان لـه ڕێگـا كورته‌كـه هێنـا، كـه لاسـایی كردنه‌وه‌ی قورئانـه و هێنانی سووره‌تێكی وه‌ك ئه‌وه و، له بریی ئه‌مه ڕێ‌یه‌كی درێژیان گرته‌به‌ر، كـه ڕێـی جـه‌نگ و ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی چه‌كدارانه‌یه و، ڕێ‌یه‌كه كاولكاریی له دووتوێدایه و زیـان به گیان و سامانیان ده‌گه‌یه‌نێت.. ئه‌وان به هه‌ڵبژاردنی ئه‌م ڕێگایه، ئه‌وه‌مان بۆ ده‌چه‌سپێنن كه هه‌رگیز گرتنه‌به‌ری ڕێگا كورته‌كه له تواناد‌ا نی‌یه و بۆ هیچ كه‌سێك مه‌یسه‌ر نابێت!

هه‌روه‌ها ملیۆنه‌ها كتێبی عه‌ره‌بیمان له به‌رده‌ستدان، كه یان دۆسـت و پشـتگرانی قورئـان بـه نیـازی چـاوكردن لـه شـێوازه‌كه‌ی و شـوێن پـێ هـه‌ڵگرتنی.. یـان دوژمنـانی بـۆ مه‌به‌سـتی به‌ره‌نگاری كردن و ڕه‌خنه لـێ گرتنی، نووسیویانن..

خۆ هەموو ئـەو کتێبانـەی کـە نووسـراون و دەشنووسـرێن، سـەرباری بـەرەوپێش چوونـی شـێوازیان، کـە ئـەویش ئـەنجامی لـە دوای یـەکتر هـاتنی بیرەکانیـان و سـوودوەرگرتنی دوایینەکانیانە لە پێشینانیان، کەچی لـەو کاتـەوە تـا ئێستا، هیـچ کـام لـەو نووسراوانە نە لـە شێوازی قورئان دەچێت نە نزیکیشی دەبێتەوە! تەنانەت ئەگەر پیاوێکی عەوامیش گوێی لـە خوێندنی قورئان بێت، هەست بەو ڕاستی‌یە دەکات و ناچار دەڵێت : (ئەم قورئانـە لـە هیـچ کـامێکی ئـەو کتێبانـە ناچێت). جـا یـان ئەوەیـە ڕەوانبێژی‌یەکـەی ئـەم لـە خـوار هـی ئـەو کتێبانەوەیە، یـان لـە سـەرووی هەموویانەوەیە. خـۆ هیـچ مرۆڤێـك - هـەر کەسـێك بێـت - تەنانەت کافر و مرۆڤی نەفامیش ناتوانێت بڵێت: ڕەوانبێژی‌یەکەی لە خوار ئەوانەوەیە.

جارێکیان یەکێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لله مـا في السـموات والأرض﴾ (الحديد: ١) پاشان وتی:

- من هیچ ڕوویەکی ئیعجاز لە ڕەوانبێژیی ئەم ئایەتەدا نابینم کە ئێوە دەیبینن.

پێیان وت:

- (تۆیش وەك ئەم گەشتیارە بە ئەندێشەت بۆ ئەو سەردەمە بگەڕێرەوە کە ئەم ئایەتەی تێدا هاتووە، لەوێ گوێی لێ ڕابگرە)!

ئەویش کە بە ئەندێشە گەڕایەوە بو ئەوێ و سەیری کاتی پێش نازڵ بوونـی قورئـانی کـرد، بینیی:

بوونەوەرانی جیهان، لە بۆشایی‌یەکی چۆڵ و فراوانی بێ سنوور و جیهانێکی تیاچووی فانی‌دا فڕێ دراون و، لە بارێکی نـائومێد و شڵەژاودان و، لـەناو تاریکی‌یـەکی ڕەش و چڕدا دەگەوزێن و، بێ گیان و ژیان و هەست و نەسـت و کـار و ئـەرك و فرمـانن.. ئـا لـەم کاتـەدا، گوێی بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕاگرت و لێی ورد بووەوە، بینیی:

ئـەم ئایەتـە پەردەیـەکی دادراوەی لەسـەر ڕووی گـەردوون و سەرانسـەری جیـهان هەڵدایـەوە و، بە درەوشاوەیی و ڕوونی ڕووی گەردوون و جیهان دەرکەوت و، ئەم گوفتارە ئەزەلی و فەرمانە هەتاهەتایی‌یە دەرسێکی بـە خـاوەن هەسـتانی ڕیـز بەسـتووی چەرخـە یـەك لـە دوای یەکەکان ڕاگەیاند و بۆی ڕوون کردنەوە کە:

ئـەم گەردوونـە وەك مزگـەوتێکی مـەزن وایـە و، بوونـەوەرانی ناویشـی - بـە تایبـەت ئاسمانـەکان و زەوی - سـەرگەرمی زیکـر و تـەهلیل و تەسـبیحاتی گـەرموگوڕی تایبـەتیی خۆیانن و، هەریەکەیان بەوپەڕی شادمانی و تاسەمەندی‌یەوە کار و ئەرکی خۆیان خستووەتە ئەسـتۆ و، بەوپـەڕی بەختـەوەری و سوپاسـگوزاری و پێزانینیشـەوە ئـەنجامیان دەدەن و ڕایاندەپەڕێنن.

ئەم گەشتیارە، بەم جۆرە کاریگەریی ئەم ئایەتە پیرۆزەی لە گەردووندا بینی و، ئنجا مەودای بەرزی و ڕەوانبێژیی‌یەکەی چەشت و، گشت ئایەتەکانی تریشی بەم چاوە بینی و بەم پێوەرە هەڵی سەنگاندن. پاشان لە نهێنیی ئەوەش گەیشت کە ڕەوانبێژیی بێ وێنەی قورئانی پیرۆز بەسەر نیوەی گۆی زەوی و پێنجیەکی گرۆی مرۆڤدا زاڵ و شکۆدارە و، دوای ئەوەش پەیی بە حیکمەتێك برد لە نێوان ئەو هەزاران حیکمەتانەی کە وان لە بەردەوام بوون و نەبڕانەوەی شکۆمەندیی دەستەڵاتی قورئانی پیرۆزدا، بۆ ماوەی چواردە سەدەی ڕەبەق بەوپەڕی ڕێزەوە.

● **خاڵی چوارەم:**

قورئانی پیرۆز دارای سازگاری و شیرینی‌یەکی ڕەسەن و ڕاستەقینەی ئەوتۆیە کە بە دووپات کردنەوەی زۆر و بەردەوامیشی نابێزرێت و هەرگیز خوێندنەوەی زۆری نابێتە مایەی بێزاری، لە کاتێکدا کە دووپات بوونەوە لە شتی تردا، با زۆر خۆش و شیرین و بەتامیش بێت، هۆی بێزاربوون و لەبەرچاو کەوتنە. بەڵکو قورئانی پیرۆز، بە دووپات کردنەوەی خوێندنەوەی، پتر شیرینی و سازگاری‌یەکەی زیاد دەبێت و دەردەکەوێت. ئەمەش ڕاستی‌یەکە هەر لەو سەردەمەوە تاکو ئێستا لای هەموو کەسێك سەلماوە و، بە نموونە دەهێنرێتەوە.

بەم جۆرە، قورئانی پیرۆز هێندە تەڕی و پاراوی و لاوی و تازەیی دەرخستووە کە تا ئێستاش هەموو ئەمانەی پێوە دیارە و، هەرچەندەش وا چواردە سەدەیە نازڵ بووە و هەموو کەسێك بە ئاسانی دەستی دەکەوێت کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، دەڵێی ئا ئێستا بە تازەیی نازڵ بووە. هەموو سەردەمێکیش قورئانیان هەر ئاوا بە لاوی و پاراوی و تازەیی وەرگرتووە و، وەك تەنها بە تایبەتی لەگەڵ ئەواندا بدوێت ئاوا لە بەرچاویاندا دەرکەوتووە. گشت تاقمێکی زانست مەشرەبی هەموو کاتێکیش دەبینن قورئان پارێزگاریی لاوی و تازەیی شێوازەکانی دەکات و پاراویی شێوەی ڕوونکردنەوەکانی ڕادەگرێت، هەرچەندەش قورئانیان لە بەردەستدایە و هەردەم لێی هەڵدەگۆزن و شوێن‌پێی هەنگاوی شێوازی ئەو هەڵدەگرن.

● **خاڵی پێنجەم:**

قورئانی پیرۆز یەکێك لە باڵەکانی ڕووەو "ڕابوردوو" و، ئەوی تریشی بەرەو "داهاتوو" بڵاو کردووەتەوە، چونکە بناغە و بنچینەی قورئان و یەکێك لە دوو باڵەکانی ئەو ڕاستی‌یەیە کە هەموو "پێغەمبەرانی پێشین" لە سەری یەکیان گرتووە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز تەسدیقیان دەکات و پشتیان دەگرێت و، ئەوانیش پشتی ئەم دەگرن و بە زمانی حاڵی یەك‌گرتنیان لەگەڵ

قورئاندا، تەسدیقی دەكەن.. هەروەها "ئەولیا و پیاوچاكان و دەروون خاوێنەكان"یش "بەر"ێكن ژیانیان لە "درەختی قورئان"ی پیرۆزەوە دەست كەوتووە.

جا پێگەیشتن و زیندوویی ئەم بەرە پێگەیشتووانە بەڵگەی ئەوەیە كە درەختە پیرۆزەكەیان بەخشندە و خاوەنی ژیان و، دارای ڕێژنەی بەردەوام و ڕاستی و ڕەسەنایەتی‌یە. چونكە هەموو ئەو كەسانەی كە ڕۆشتوونەتە ژێر چاودێری و پارێزگاریی باڵی دووهەمی قورئان و لە سایەی‌دا ژیاون، لە شوێنكەوتووانی تەریقەتە ڕاستەقینەكانی ئیسلام، هەر هەموویان شایەتی دەدەن كە قورئانی پیرۆز عەینی حەق و كۆگای ڕاستی‌یەكانە و، لە "گشتی‌بوون" و "هەمەلایەنگیری"دا هەرگیز هاوتا و وێنەی نی‌یە، كەواتە موعجیزەیەكی ڕوون و ئاشكرایە.

● **خاڵی شەشەم:**

هەر شەش لاكانی قورئان ڕوون و ڕووناكی‌بەخشن. ئەمەش ڕاستی و دادگەریی قورئان دەردەخات..

بەڵێ، "لای خوارەوەی" قورئان و ژێرەوەی: ستوونی بەڵگەكانە و لەسەریان ڕاوەستاوە.. لە "لای سەروویشیەوە": مۆری ئیعجازی لەسەر نەخشاوە.. "بەردەم و ئامانجیشی": دیاری‌یەكانی بەختەوەریی هەردوو دنیان.. لە "پشتیشیەوە" واتە خاڵی پشت پێ‌بەستنی: ڕاستی‌یەكانی سرووشی ئاسمانی ریزیان بەستووە.. لە "لای ڕاستیشیەوە": تەسدیق كردنی چەندین بەڵگەی بێ‌سنوور و لەژمارەبەدەری ژیری‌یە ڕاستەكانە.. "لای چەپیشی": دڵنیایی و كێش‌بوون و تەسلیم و ملكەچیی تەواوەتیی دڵە ساغ و دەروون و هەناوە خاوێنەكانە.

جا هەروەك ئەم شەش لایانە دەیچەسپێنن كە: قورئانی پیرۆز قەڵایەكی ئاسمانیی وەهایە لەسەر زەوی‌دا كە هیچ شتێك ناتوانێت بیبڕێت و كەلێن لە دیوارەكەی‌دا دروست بكات.. هەروەها شەش مەقامیش هەن جەخت لەسەر ئەوە دەكەن و دەیچەسپێنن كە: قورئان خۆی لە خۆی‌دا ڕاست و ڕەوایە و، هەرگیز گوفتاری مرۆڤ نی‌یە و، لە هیچ لایەكیەوە ناڕەوایی توخنی ناكەوێت.

مەقامی یەكەمیان بریتی‌یە لە پشتگیری كردنی ئەم قورئانە پیرۆزە لە لایەن كارساز و بەڕێوەبەری ئەم گەردوونەوە، كە خوایەكە دەرخستنی جوانی و، پارێزگاری كردنی چاكە و ڕاستی و، نەهێشتن و لابردنی فێڵباز و درۆزنانی كردووە بە یاسایەكی كارگوزاری كارای خۆی..

ئەم خواوەندە مەقامێكی ڕێزلێنانی وەها و پلەوپایەیەكی ئەوتۆی لە هەموو جیهاندا بەم قورئانە بەخشیوە كە لە هەموو پلە و پایە و مەقامێك بەرز و پایەدار و زاڵترە و، بەمەش تەسدیق و پشتگیریی خۆی بۆ قورئان دەربڕیوە.

پاشان ئەو ڕێزە شایان و باوەڕە بەتین و ڕەگداکوتاوەی کە زاتی مەزنی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر قورئانی پیرۆز دەری بڕیوە، لە سەرووی هەموو ڕێزێکەوەیە. ئەم پێغەمبەرەی ﷺ کە سەرچاوەی ئیسلام و ڕوونکەرەوەی قورئانە و، بێ هیچ ویستێکی خۆی لە نێوان بێداری و نوستندا "وەحی"ی بۆ نازڵ دەبوو، ئەم پێغەمبەرەی کە فەرموودەکانی تری هەرگیز ناگەنە ئاستی قورئان، تەنانەت هەر لەویش ناچن، هەرچەندە ڕەوانگۆترین کەسیشە.. هەروەها ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەم قورئانە: ڕووداوە غەیبی‌یە گەردوونی‌یەکانی پێشین و داهاتووشی بەوپەڕی دڵنیایی و باوەڕبەخۆبوون و بێ هیچ دوودڵی‌یەك ڕوون کردووەتەوە، هەرچەندەش نەخوێندەوار بووە. ئنجا لەمەشدا هیچ فێڵ و هەڵە و شتێکی وەك ئەمانەی - با بچووکیش بوو بێت - لێ نەبینراوە، هەرچەندەش لە نێوان کەسانێکدا ژیاوە کە تابڵێی سەرنجی هەڵسوکەوتەکانی ئەویان داوە..

جا باوەڕهێنانی ئەم ڕوونکەرەوە و ڕاگەیەنەرە مەزنەی قورئان کە پێغەمبەرە ﷺ و، دڵنیایی و نەلەرزینی لە هیچ شتێکدا - با زۆر گەورەش بووبێت - پشتی ئەوە دەگرێت و دەیچەسپێنێت کە: قورئانی پیرۆز ئاسمانی‌یە و، ڕاست و ڕەوا و داد و گوفتاری پیرۆزی پەروەردگاری میهرەبانە.

هەروەها پەیوەست بوونی پێنجیەکی گرۆی مرۆڤ، بەڵکو نیوەی هەرە مەزنیان، بەم قورئانە پیرۆزەی کە لە بەردەمیاندایە و بە چاو دەیبینن، بە پەیوەندی‌یەکی گەرموگوڕی ئایینداری و گوێڕاگرتنی پڕ لە شەوق و تاسە و ئارەزوومەندی و، هاتنی پۆل پۆلی جینی و مەلائیکەت و ڕۆحانی‌یەکان بۆ لای و کۆبوونەوەیان لە دەوری لە کاتی خوێندنەوەی‌دا بە چەشنی پەپوولەی شەیدای ڕووناکی، بە شایەتیی چەندەها ڕووداوی زۆر و نیشانەی زەبەندە و "کەشف"ی ڕاستی گەلێ کەس لە پیاوچاکان..

هەموو ئەمانە، تەسدیقی ئەوە دەکەن کە ئەم قورئانە جێی ڕەزامەندی و مایەی سەرسووڕمانی گشت بوونەوەرانە و، لەم گەردوونەدا مەزنترین پلەوپایەی پێ دراوە.

هەروەها هەموو چینێك لە چینەکانی مرۆڤ، هەر لە عەوامەکان و تەمبەڵترین کەسەوە تا دەگاتە کەسانی یەکجار زیرەك و زانا، بەشی خۆیان بە تەواوی لەو دەرسانە وەردەگرن کە قورئانی پیرۆز دەیانڵێتەوە و قووڵترین ڕاستی‌یەکانی تێ‌دەگەن و لێی وەردەگرن.. هەروەها سەرجەمی زانایانی سەدان زانست و هونەری ئیسلامی، بە تایبەت موجتەهیدانی شەریعەتی خاوێن و، لێکۆڵەرانی ئوسووڵی دین و بلیمەتانی زانستی کەلام و هاوچەشنیان، وەڵامی شیفابەخشی پێداویستی‌یەکانی تایبەت بە زانیاری‌یەکانیانەوە لە قورئانی پیرۆز دەرهێناوە و هەڵکۆڵیوە..

هەموو ئەمانە، تەسدیقی ئەوە دەکەن کە قورئانی پیرۆز سەرچاوەی حەق و کانگای ڕاستی‌یە.

هەروەها بەرپەرچ نەدانەوەی قورئان لە لایەن ئەو ئەدیبە عەرەبانەی كە لە پێشەنگی كاروانی ئەدەبەوەن، بە تایبەت ئەوانەیان كە موسڵمان نەبوون، هەرچەندەش حەزیان لە بەرەنگاریی كردووە. هەروەها دەستەوسانی و كۆڵەواریی تەواویان بەرامبەر تەنها یەك ڕووی حەوت ڕووە مەزنەكانی ئیعجازی قورئان (كە ڕووی ڕەوانبێژییەتی) و كۆڵەوارییان لە هێنانی شتێكی وەك تەنها یەك سوورەتی قورئان و، خۆدزینەوەیان لەم تەحەددا و داوایەی قورئان.. هەروەها بەرەنگار نەبوونەوەی ڕەوانبێژە بەناوبانگ و زانا بلیمەتەكان – تاكو ئێستا – بەرامبەر بە هیچ كام لە ڕووەكانی ئیعجازی قورئان، هەرچەندەش حەزیان دەكرد بەم چەشنە بەرەنگارییە ناوبانگ دەربكەن و ناویان بڵاو ببێتەوە.. بەڵێ، بێدەنگییان لە ئاستی ئەمەدا، كۆڵەوارییان پیشان دەدات، ئەوەتا ئەوان لەم بوارەدا هیچ هەنگاوێكیان نەنا!

هەموو ئەمانە، بەڵگەیەكی گومانبڕن لەسەر ئەوەی كە قورئانی پیرۆز خۆی بۆ خۆی موعجیزەیە و لە سەرووی توانا و وزەی مرۆڤەوەیە.

بەڵێ، بەها و بڵندی و ڕەوانگۆیی هەر گوفتارێك بەوە ڕوون دەبێتەوە كە بزانرێت: (كێ وتوویەتی؟ بە كێی وتووە؟ بۆچی وتوویەتی)؟!

جا لەسەر بناغەی ئەمە، تا ئێستا نە هاووێنەی قورئانی پیرۆز هاتووە و، نە دێت و، نە هەرگیز هیچ شتێك نزیكی دەبێتەوە. چونكە قورئانی پیرۆز فەرمایشتی پەروەردگاری هەموو جیهانەكانە و گوفتاری بەدیهێنەریانە و، قسەكردنێكە هەرگیز بە هیچ جۆرێ لاسایی ناكرێتەوە و، هیچ نیشانەیەكی ئەوتۆی پێوە نییە كە ئەوە بگەیەنێت خۆكردەیی(التصنع)ی تێدا بێت..

هەروەها ئەو كەسەی كە قورئان گوفتاری خۆی ئاراستە دەكات نوێنەری گرۆی مرۆڤ بەڵكو نوێنەری سەرجەمی بوونەوەرانە بە گشتی و، بەرێزترین قسەبۆكراو(مخـاطب)ە و، ناویشی لە ناوی هەموان بەرز و پایەدارترە و، ئەم ئیسلامە مەزنە لە هێز و فراوانیی ئیمانەكەی ئەو كەسەوە سەرچاوەی گرتووە و، ڕێزیشی لە ڕادەیەكدایە كە بۆ "قاب قوسین" یان نزیكتریش سەرخراوە و بە گوفتار و لەگەڵ دوانی خواوەندی بێوێنە پایەدار كراوە و ڕێزی لێ نراوە.

پاشان قورئانی پیرۆز ڕێی بەختەوەریی هەردوو دنیا و ئامانجەكانی بەدیهێنانی گەردوون و مەبەستە پەروەردگارییەكانی لەمەڕ گەردوونی ڕوون كردووەتەوە.. هەروەها ئیمانە بەرز و بڵند و فراوانەكەی ئەو قسەبۆكراوە بەرێزەشی خستووەتە ڕوو، كە ئیمانێكە هەموو ڕاستییەكانی ئیسلامی لە خۆدا جەم كردووە.. قورئانی پیرۆز هەموو لایەكی ئەم گەردوونە مەزنەی یەكالا كردووە و ئەم دیو و ئەو دیوی لاپەڕەكانی خستووەتە ڕوو، وەكو كەسێك كە نەخشەیەك یان سەعاتێكی لە بەردەستدا بێت و ئالوگۆڕ و دەستكارییان بكات و هەڵیان

بگێڕێتەوە. قورئان بەم کردارەی و لە نێوان ئالوگۆڕەکانی ئەم گەردوونەدا، بەدیهێنەری "مرۆڤ و گەردوون"ی بەم مرۆڤە ناساندووە.

کەواتە هیچ گومانێك لەوەدا نی‌یە کە: هەرگیزاوهەرگیز هێنان و پەیداکردنی هاووێنەی ئەم قورئانە لە توانای کەسدا نی‌یە و، ناکرێت هیچ شتێك بگاتە پلەی ئیعجازی قورئان.

هەروەها هەزاران زانای هەلکەوتوو، لەوانەی کە هەریەکەیان تەفسیرێکیان لە چەندین بەرگدا بۆ قورئانی پیرۆز نووسیوە، کە هی هەندێکیان گەیشتووەتە سی یان چل یان حەفتا بەرگ تەفسیر. هەموو ئەو زانایانە بە پالپشت و بەلگەکانی خۆیان چەندین لایەنی لەژمارەبەدەری: تایبەتکاریی بەرز و سەرنجی ڕەوان و تایبەتمەندیی ورد و نهێنیی ناسك و واتای بلند و هەوالی غەیبیی زۆر و جۆراوجۆری قورئانی پیرۆزیان ڕوون کردووەتەوە. جا دەرخستن و چەسپاندنی ئەو هەموو تایبەتکاری‌یانەی قورئان لە لایەن ئەو زانا تەفسیر نووسانەوە، بەلگەیەکی گومانبڕە لەسەر ئەوەی کە قورئان موعجیزەیەکی خوایی‌یە و دەراسا و لەعادەتبەدەرە. بە تایبەت کە هەر یەکە لە کتێبەکانی "پەیامەکانی نوور" - کە دەگەنە سەدوسی کتێب - تایبەتکاری‌یەکی قورئانی پیرۆز و سەرنجێکی بێ‌وێنەی ئەویان بە چەشنێکی گومانبڕ و بە بەلگەی بەهێز چەسپاندووە. بە تایبەت پەیامی "موعجیزاتی قورئانی" و "مەقامی دووهەمی وتەی بیستەم" کە گەلێ شتی لە کارە دەراساکانی شارستانێتیی نوێ چەشنی: شەمەندەفەر و فڕۆکەی لە قورئانی پیرۆز دەرهێناوە. هەروەها تیشکی یەکەم کە ناوی: "ئاماژەکانی قورئان"ە و ئەو ئاماژانە دەردەخات کە لە قورئاندا هەن سەبارەت بە "پەیامەکانی نوور" و "کارەبا" و، ئەو هەشت پەیامە بچووکانەش کە ناویان "هەشت هێماکان"ە و مەودای ڕێسای وردی نێوان پیتەکانی قورئان باس دەکەن و تابلێی دارای نهێنی و واتای زۆر و زەبەندەن. هەروەها ئەو پەیامە بچووکەی کە باسی ئایەتەکانی کۆتایی سوورەتی "الفتح" دەکات و لە ڕووی هەوالدانی غەیبی‌یەوە بە پێنج ڕوو ئیعجازی ئەم سوورەتە دەردەخات و پەیامەکانی تریش کە وەك ئەمە وان..

جا کە هەموو یەکێك لە بەشەکانی "پەیامەکانی نوور" ڕاستی‌یەك لە ڕاستی‌یەکانی قورئانی پیرۆز و نوورێك لە نوورەکانی ڕوون دەکەنەوە، تەسدیق و تەئکیدی ئەوە دەکەن کە قورئانی پیرۆز هاووێنەی نی‌یە و دەراسا و موعجیزەیە و زمانی جیهانی "پەنهان"ە لەناو ئەم جیهانە "بینراو"ەدا و، گوفتاری خواوەندی زانای نهێنی‌یەکانە.

* * *

بەم جۆرە و لەبەر ئەم تایبەتکاری‌یانەی قورئانی پیرۆز کە لە: شەش خال و، شەش لا و، شەش مەقامدا ئاماژەیان بۆ کرا، فەرمانڕەوایەتیی نوورانی و شکۆدار و دەستەلاتی خاوێن و

پیرۆزی قورئان، بەوپەڕی ویقـار و ڕێـزەوە، بـەردەوام بـووە و، ڕووی هـەموو سـەردەمەكان و گۆی زەویشی، بە درێژایی هەزار و سێ سەد ساڵ، ڕووناك كردووەتەوە..

لەبەر هەموو ئەو تایبەتكارییانە، قورئانی پیرۆز چـەندین پلەوپایـە و دەستكەوتی قودسیی خەڵات كراوە. چونكە بەلای كەمەوە خوێندنەوەی هەر پیتێكی قورئان پاداشـتی (دە) خـێر و (دە) دانە چاكە و (دە) بەروبوومی بەهەشتی هەیـە. تەنانـەت هـەموو پیتێكـی هـەندێ ئایـەت و سـوورەت (سـەد) یـان (هـەزار) یـان زیـاتر لـە بەروبوومـەكانی دوارۆژ دەگرێـت و، لـە كاتـە پیرۆزەكاندا پاداشت و بەهای هەر پیتێك لە (دە) دانەوە بۆ (سەدان) بەرز دەبێتەوە.

ئـەم گەشـتیارەی نـاو جیـهان، لـە هـەموو ئەمانـە و چـەندین تایبـەتكاریی تـری خـاوێن و هاوچەشنی ئەمانە گەیشت و، بە "دڵ"ی خۆی وت:

(بەڵێ ڕاستە، ئـەم قورئانـە پـیرۆزەی كـە لـە هـەموو ڕوویەكـەوە خـاوەنی ئیعجـازە و، بـە: یـەكدەنگیی سـوورەتەكانی و، یـەكگرتنی ئایەتـەكانی و، تـەوافوقی نـهێنی و نوورەكـانی و، یەكاویەك بوونی بەروبووم و ئاسەوارەكانی.. شایەتییەكی بە بەڵگە چەسپاو دەدات لەسـەر: "بـوون" و "یـەكتایی" خواوەنـدی "واجـب الوجـود" و، لەسـەر سـیفەتە شـكۆدار و نـاوە جوانـەكانی، بـە ڕادەیـەك كـە هـەموو شـایەتییە لەژمارەبـەدەر و بێسـنوورەكانی گشـت ئیمانداران، تەنها چەند نمێكی ئەو شایەتیدانەی قورئانی پیرۆزن).

لە پلەی حەڤدەهەمی مەقامی یەكەمیشدا، بەم جۆرەی خوارەوە ئاماژەیەكی كورت بۆ ئەو دەرسی تەوحید و ئیمانە كراوە كە ئەم گەشتیارە لە قورئانی پیرۆز وەری گرت:

(لا إله إلاّ الله الواجب الوجود الواحد الأحد الـــذي دلّ على وجوب وجوده في وحدته: القرآن المعجز البيان المقبـــول المرغوب لأجناس المَلَك والإنس والجانّ، المقروء كلّ آياتـــه في كلّ دقيقة بكمال الإحترام بألسنة مئة مليون من نوع الإنسان، الدائم سلطنته القدسية على أقطار الأرض والأكـــوان وعلـــى وجوه الأعصار والأزمان، والجاري حاكميته المعنوية النورانيـــة على نصف الأرض وخمس البشر في أربعة عشر عصراً بكمـــال الإحتشام. وكذا شهد وبرهن بإجماع سوره القدسية السماوية وباتفاق آياته النورانية الإلهية وبتوافق أسراره وأنواره وبتطـــابق حقائقه وثمراته وآثاره بالمشاهدة والعيان).

# پاشكۆی دووهەم

## (مەسەلەی دەهەمی پەیامی (بەری درەختی ئیمان) كە تیشكی یازدەهەمە)

## گوڵی ئەمیرداغ

**(ئـەم مەسـەلـەیە وەڵامدانەوەیـەكی بـاش و قەناعـەت بەخشـی ئـەو ئیعتیرازانەیە كە لـە دووپات بوونەوەكانی قورئان دەگیرێن)**

برا ئازیز و بەوەفاكانم!

كاتێك دەستم بە نووسینی ئـەم مەسـەلـەیە كـرد، لـە بـارێكی گەلـێ پەرێشـان و شـڵەژاودا بووم. لەبەر ئەوە، تا ڕادەیەك تەماوی دیارە و وەك پێویست ڕوون نییە. چونكە چۆنم بە دڵدا هات و نووسیم، هـەروەهایش مایـەوە. بـەڵام دوایـی تێ گەیشتم كـە ئـەم دەستەواژە ئاڵۆزانـە ئیعجازێكی جوانیان تێدایە، كە بە داخـەوە نـەمتوانی مـافی تـەواو بـەو ئیعجـازە بـدەم و دەری ببڕم.

جا ئەم نامەیە هەرچەند ڕووناكییەكانی كز بن، بەڵام لـە ڕووی پـەیوەندییان بـە قورئـانی پیرۆزەوە بە "پەرستنێكی فیكـری" دادەنرێـت و، بـە "گەوهـەر"ێـك دەژمـێررێت كـە چـەندین مرواریـی درەخشـان و بـەنرخی تێـدا بێـت. لەبـەر ئـەوە، تكـام وایـە ڕوو لـە توێكڵەكـەی وەربچـەرخێنن و بـە وردی بـۆ مرواریـیە پرشـنگدارەكانی بڕوانـن. دوای ئـەوە ئەگـەر لـە ڕاستیدا بە شتێكی شایانتان زانی، ئەوا بیكەن بە: (مەسەلەی دەهەمی پـەیامی بـەری درەختـی ئیمان) دەنا بە وەڵامدانەوەی پیرۆزباییەكەتانی دابنێن. ئنجا لەڕادەبەدەریش ناچار بـووم كـە زۆر بە كورتی بینووسم، چونكـە لـە كـاتی نووسینیدا بەدەسـت بـەدخۆراكی و ئازارەكـانی نەخۆشییەوە دەتلامەوە، ئەمەش لە ڕادەیـەكی وادا بـوو كـە لـە ناچاریدا چـەندین ڕاستـی و بەڵگەی زۆرم لە تەنها یەك ڕستەدا دانـاوە و، بـە فـەزڵی خـوای گـەورە لـە دوو ڕۆژی مـانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا تەواوم كرد. وا داوای لێبـوردن دەكـەم لـەو كەموكووڕییـەی كـە لێمـەوە دەركەوت[1].

---

(١) ئەم مەسەلەیە گوڵێكی ناسك و درەخشانی ئەم مانگە پیرۆزە و شاری ئەمیرداغە، خرایە سەر میـوەی بەندیخانـەی دەنیزلی و كرا بـە "مەسـەلـەی دەهـەم". جـا ئـەم مەسـەلـەیە - بـە ئیزنی خـوا - ئـەو ژەهـری وەهـم و خەیاڵـە بۆگەنـەی گومرایان سەبارەت بە دیاردەی دووپات بوونەوە لە قورئاندا، لادەبـات. ئەمـەش بـەهۆی ڕوونكردنـەوەی تەنـها یـەك حیكمەتەوە لە حیكمەتە زۆرەكانی ئەم دیاردەیە. (دانەر)

برا ڕاست و بەوەفاکانم!

کاتێك لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا خەریکی خوێندنی قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجاز بووم، لە واتای ئەو سی و سێ ئایەتە ورد بوومەوە کە ئاماژەیان بۆ پەیامەکانی نوور کردووە، وەك لە "تیشکی یەکەم"دا باس کراوە، بۆم دەرکەوت کە هەریەك لەو ئایەتانە، بەڵکو ئایەتەکانی ئەو لاپەڕەیەی موصحەف و ئەو بابەتەی لێی دەدوێن وەك بڵێی ڕووەو پەیامەکان و قوتابییانی نوور دەڕوانن. ئەمەش لەو ڕووەوە کە ئەوان بەشێکیان لە لێشاوی فەڕ و پیرۆزیی ئەو ئایەتانە دەست کەوتووە. تەنانەت ئایەتی (نوور) کە لە سوورەتی "نوور"دایە، بە هەر دە پەنجەکان ئاماژە بۆ پەیامەکانی نوور دەکات، هەروەها ئایەتەکانی دوای ئەو، کە ئایەتی "ظلمـــات"ن، ڕووەو نەیار و دوژمنانی پەیامەکانی نوور دەڕوانن و بەشێکی زۆریان لەم ڕوانینەی خۆیان ئاراستە دەکەن، چونکە وەك ئاشکرایە: پلە و پایە و دووریی‌یەکان(أبعاد) و مەبەستەکانی ئەو ئایەتە تەنها بە کات و شوێنێکی دیاری کراوەوە نەبەستراوە. واتە لە قاوغی هەندەکێتیی کات و شوێن دەردەچێت و بەرەو هەمەکی‌یەکان پەرواز دەبێت. لەبەر ئەوە، هەستم کرد کە پەیام و قوتابییانی نوور بە ڕاستی دەوری یەکێك لە تاکەکانی ئەو هەمەکی‌یە دەبینن لەم سەردەمەی ئێستای خۆماندا.

گوفتاری قورئانی پیرۆز، سیفەتی: (هەمەکێتی و، فراوانیی ڕەها و، بەرزی و، شموول)ی بەدەست هێناوە. چونکە ڕاستەوخۆ لە پلەوپایەی هەرە فراوانی پەروەردگاریتی‌یە گشتی‌یەکەی خاوەن گوفتاری ئەزەلی‌یەوە دەرچووە..

هەروەها قورئانی پیرۆز ئەم سیفەتانەی لە پلەوپایەی مەزن و فراوانی ئەو کەسەوە وەرگرتووە کە ئەم کتێبەی بۆ نێرراوە، کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەیە ﷺ بە ناوی هەموو مرۆڤایەتی‌یەوە، بەڵکو بە ناوی هەموو بوونەوەرانەوە، لە لایەن خواوەندەوە، گوفتاری لەگەڵ دەکرێت..

هەروەها ئەم سیفەتانەی لەوەوە دەست دەکەوێت کە ئەم گوفتارەی قورئان ڕوو لە پلەوپایە فراوانەکەی هەموو چینەکانی مرۆڤایەتی و لە هەموو سەردەمێکدا بە گشتی، دەکات..

هەروەها لەو پلەوپایە بەرزەی ڕوونکردنەوە کامڵ و شیفابەخشەکانی ئەو یاسا خواییانەوە دەستی دەکەوێت کە پەیوەندی‌یان بە دنیا و قیامەت و، زەوی و ئاسمان و، ئەزەل و ئەبەدەوە هەیە و تایبەتن بە پەروەردگاریتیی خواوەندەوە و کاروباری هەموو بوونەوەران دەگرنەوە.

جا ئەم گوفتـارە مەزنـەی کـە ئـەم هـەموو فراوانـی و بـەرزی و شموولـەی دەسـت کـەوت، ئیعجازێکی قەشەنگ و دەورەدانێکـی گشتی دەردەخـات. بـە چەشـنێك کـە پلـە سروشـتی و ئاشکراکانی هەروەك بە نـەرمونیانی لەگـەڵ تێگەیشتنی سادەی عەوامەکاندا (کـە زۆربـەی گفتوگۆ لەگەڵ کراوانی قورئانن) مامەڵە دەکات، هەروەها بەشێکی زۆریش لـە ڕێنمـایی و واتاکـانی بـە بـەرزترین ئاستە فیکـری و چینـە عەقڵییەکانی مـرۆڤ دەبەخشـێت.. کەواتـە وەنـەبێت تەنـها بەشـێکی کـەم لـە ڕێنماییـەکانی بـە گفتوگـۆ لەگـەڵ کراوانـی خـۆی ببـەخشـێت و تەنـها بـە یـەك پـەندی چیرۆکێکی مێژوویـی تایبەتمـەندیان بکـات، بـەڵکو لەبـەر ئەوەی هەموو چینێك لە هەموو سەردەمێکدا تاکێکـە لـە تاکـەکانی دەستوورێکی هەمـەکی، ئەوا قورئانی پیرۆز ڕوو لە هەموو چینێکی هەموو سەردەمێك دەکات و بە گوفتارێکی تـازە و نوێ و پاراو وەك بڵێی ئا ئێستا نازڵ بوو بێت، لەگەڵیاندا دەدوێت..

بە تایبەتی کە بە زۆری: (الظالمين.. الظالمين) دووپات دەکاتەوە و بە تونـدی سەرزەنشتیان دەکات و هەڕەشەی سـامناکیان بـە هـاتنی بـەڵا و موسـیبەتی زەوی و ئاسمـان بـەهۆی تـاوان و ستەمەکانیانەوە ئاراستە دەکات. بەم دووپات کردنەوەیەش سەرنجی خـەڵکی بۆ لای چـەندین ستەمی وا ڕادەکێشـن کـە لـەم چەرخـەدا وێنـەیان نییـە. ئەمـەش بـەهۆی باسـکردنی چـەند جۆرێکی ئەو ئەشکەنجە و بەڵا و موسیبەتانەی هاتنە ڕێی قەومی عـاد و سـەموود و فیرعـەون و، بـە باسـکردنی ڕزگـاربوونی چـەندین پێغەمبـەری بـەڕێزی وەك حـەزرەتی ئیبراهیم و مووسـا، درووودیان لەسەر بێت.

پاشـان ئـەم قورئانـە مەزنـە بـە ئیعجـازێکی قەشـەنگ و ڕوون هــەموو چینێـك لــە هــەموو سەردەمێکدا بۆ ئەوە ڕێنمایی دەکات کە: کاتـە ڕابوردووەکـان و سـەردەمە لـەناوچووەکانی زوو، لە ڕوانگەی گومڕایانی بێئاگاوە بریتییە لە شیوێکی قوڵی عـەدەم و چۆڵ و سـامناك و گۆڕستانێکی ئازاردەری پڕ لە خەفەت و دەردیسەری.. ئەمەی کـە گومڕایی وامـان پیشـان دەدات، قورئـان وەکو لاپەڕەیـەکی زینـدووی پڕ لـە پـەند و دەرس و عیـبرەت و، جیـهانێکی سـەیری وا پیشـانمان دەدات کـە لـەم سـەر تـا ئـەو سـەر بــە "ژیــان" ڕازاوەتـەوە و، وڵاتێکـی پەروەردگاریانـەی ئـەوتۆ کـە چـەندین جـۆر پـەیوەندییان لەگـەڵماندا هەیـە.. ئەمـەشمان بـە ئیعجازە بێوێنەکەی خۆی و وەك لەسەر شاشەدا پیشانمان بدرێت، ئـاوا بـۆ ڕوون دەکاتـەوە. جا هەندێ جار ئەو سەردەمانە بۆلای ئێمە دەهێنێت و بە زەقی دەیانخاتـە بـەرچاومان، هـەندێ جاری تریش ئێمە بۆ ئەو سەردەمانە دەبات.

ئەو "گـەردوون"ەی کـە لـەخواغافڵان بـە بۆشـاییەکی سـامناکی بـێ بـن و چـەند بـێ گیانێکی شڵەژاوی دەبینن کە لە گێـژاوی ئـازار و جوداییدا تلـێر دەبنـەوە و گێژ دەخۆن..

قورئانی پیرۆز، بە هەمان ئیعجاز، ڕوونـی دەکاتـەوە کـە: ئـەم (گەردوونـە) کتێبێکـی ڕەوانـە، خواوەنـدی تاك و تـەنیا و صەمـەد نووسـیویەتی و، شـارێکی ڕێکوپێکـە کـە خواوەنــدی بـە بـەزەیی و میـهرەبان ئـاوەدانی کردووەتـەوە و، پیشـانگایەکی قەشـەنگ و بـێ وێنەیـە کـە پەروەردگار بـۆ پیشـاندان و ناوبـانگ پێدەرکردنی بەدیـهێنراوانی خـۆی ئامـادەی کـردووە. قورئانی پیرۆز، بەم ڕوونکردنەوەیە، ژیان بەو بێگیانانە دەبەخشێت و وایان لــێ دەکـات کـە لـە نێوان خۆیاندا بەدەم یارمەتیدانی یەکترەوە بڕۆن، وەك بڵێی بە جۆرێکی ڕاسـتەقینە و پـڕ لـە خۆشەویستی لەگـەڵ یـەکتر بدوێـن و وتووێـژ بکـەن، دەبینیـت هـەموو شـتێك کـار و ئـەرك و فەرمانبەرییەکی پێ سپێرراوە..

بـەم جۆرە، قورئـانی پـیرۆز دەرسـی حیکمـەتی ڕاستەقینــە و زانسـتی ڕووناکیبەخش بـە جینـــی و ئینس و مەلائیکـەتان دەڵێتـەوە. کەواتـە بـێ هیـچ گومـانێك ئـەم قورئانـەی کـە ئـەم ئیعجازەی لە ڕوونکردنەوەی شتاندا هەیە، شایانی ئەوەیە کـە چـەند تایبەتکارییـەکی بـەرز و پیرۆز بەدەست بهێنێت، وەك ئەوەی کە:

خوێندنەوەی هەر پیتێکی (دە) چاکە، بەڵکو لە هەندێ جاردا (هەزار) تەنانەت لە هەندێ جاری تردا (هـەزاران) چاکـە دەست خوێنەرەکـەی دەخـات.. هـەروەها وەك کۆڵـەواری و دەستەپاچەیی هەموو جیننی و ئادەمیزاد لـەوەدا کـە شـتێکی هاووێنـەی ئـەو قورئانـە دروسـت بکەن، با هەر هەمووشیان بۆ ئەو مەبەستە کۆ ببنەوە.. هـەروەها وەك گفتوگـۆ و دوانـی پـڕ لـە بەلاغەت و داناییانـەی لەگـەڵ ئـادەمیزاددا، بـەڵکو لەگـەڵ هـەموو بوونـەوەراندا بـە گشـتی.. هەروەها وەك ئەوەی کە لـە هـەموو سـەردەمێکدا ملیۆنـان کـەس بەوپـەڕی ئارەزوومـەندی و چێــژ لــێ وەرگرتنــەوە حــەزیان بــە لەبەرکردنیــەتی.. هــەروەها وەك بــێزار نــەبوون لـــە زۆرخوێندنـەوەی، سـەرەڕای دووپـات بوونەوەکانیشـی.. هـەروەها وەك جێگـیربوونی بـە تەواوی لە زەینی ناسك و سادەی منالاندا، هەرچەندە جێگا و ڕستەی زۆری وەهایشی تێدایە کـە لەوانەیـە لێیـان تێـك بچێـت.. هـەروەها وەك لـەزەت وەرگرتنـی بیمـاران و ئەوانـەی لـــە سەرەمەرگ و گیانەڵادان لە بیستنی قورئـان و خـۆش بوونـی لـە گوێیـاندا، هەرچـەندەش بـە سـادەترین قسە بێزار دەبن.. ئەمانە و غەیری ئەمانەش، لەو تایبەتکارییە بەرز و پیرۆزانەی کە قورئانی پیرۆز دەستی کەوتووە و، بەمانەش بەختەوەریی هەردوو دنیا بە خوێنەران و قوتابییانی خۆی دەبەخشێت.

هەروەها قورئانی پیرۆز ئیعجازە جوانەکەی خۆی لە "شێوازی ڕێنماییـە ڕەوانەکـەی"دا دەردەخات. ئەوەتا زۆر بە جوانـی چـاودێریی نەخوێندەواریی ڕاگەیەنەرەکـەی ﷺ کـردووە، بەوەدا کـە شـێوازە ڕەوانـە سروشـتییەکەی خـۆی بـە بـەردەوامی هێشـتووەتەوە و، زۆر لـەوە

بەرزترە کە هیچ جۆرە تەکەللوف و ڕیایەك توخنی بکەوێت. شێوازەکەی بە چەشنێکی وایە عەوامەکان - کە زۆربەی زۆری خەڵکن - لێی تێدەگەن. شێوازی قورئان لەگەڵ ئەوانەدا بە جۆرێکە کە زۆر بە نەرم و ناسك و سادەیی مامەڵە لەگەڵ زەینیاندا دەکات، بۆ ئەمەش گفتوگۆکان دادەبەزێنێتە ئاستێکی نزیك لە تێگەیشتنیانەوە و، چەند لاپەڕەیەکی ئاشکرا و ڕوونی وەك ئاسمانەکان و زەوییان لە بەردەمدا بڵاو دەکاتەوە و، سەرنجی بینەران بۆ موعجیزاتی توانستی خوا و دێرەکانی دانایییە لەڕادەبەدەرەکەی، کە لە ژێر پەردەی کاروبارە ئاسایییەکانەوەن، ڕادەکێشێت.

پاشان قورئانی پیرۆز جۆرێکی تری ئیعجازە بێوێنەکەی خۆی بەوە دەردەخات کە بە چەشنێکی "ڕەوان" ڕستەیەك یان چیرۆکێك "دووپات دەکاتەوە" لەو کاتانەدا کە ڕێنمایی چەندین چینی جیاوازی خەڵکی بۆ چەند واتایەکی جۆراوجۆر و، چەندین پەند و عیبرەتی زۆر لەو ئایەتە یان لەو چیرۆکەدا دەکات. لەبەر ئەوە، قورئان داخوازی ئەوەیە کە دووپات بوونەوەی تێدا بێت، چونکە هەروەك کتێبی پاڕانەوە و بانگەوازە، کتێبی زیکر و یەکتاناسینی خواوەندیشە. خۆ دیارە هەریەك لەمانە داخوازی دووپات کردنەوەیە. کەواتە هەر ئایەتێك یان هەر چیرۆکێك لە قورئاندا دووپات کراوەتەوە، واتایەکی تازە و پەندێکی نوێی تێدایە.

هەروەها ئیعجازەکەی خۆی بەوە دەردەخات کە (لە چەند ڕووداوێکی جوزئی دەدوێت) و دەکۆڵێتەوە کە لە ژیانی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەردا ﷺ و لە کاتی نازڵ بوونی قورئان و دامەزراندنی بینای ئیسلام و بناغەکانی شەریعەتدا ڕوویان داوە. دەبینیت گرنگییەکی زۆر بەو ڕووداوانە دەدات و، بەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە وردترین کاروباری بچووکترین ڕووداوی هەندەکی، لە بەرچاوی میهرەبانیی خوای گەورەدا و لە نێوان بازنەی بەڕێوەبردن و کارسازیی ئەو خواوەندەدایە. ئەمە جگە لەوەی کە بە باسکردنی ئەو ڕووداوانە چەند یاسا و دەستوورێکی گشتی و هەمەلایەنگری خواوەند کە لە گەردووندا کار دەکەن، دەردەخات.. لەمانەش زیاتر: ئەو ڕووداوانە کە لە کاتی دامەزراندنی ئیسلام و شەریعەتەکەیدا ڕوویان داوە، وەك ناوك و تۆو وان، لە داهاتوودا چەندین بەروبوومی ئەحکام و سوود و قازانج دەگرن.

بەڵێ، (دووپات بوونەوەی پێویستی داخوازی دووپات بوونەوەی باسکردنیشیەتی). ئەمەش دەستوورێکی چەسپاوە. لەبەر ئەوە، قورئانی پیرۆز لە ماوەی بیست ساڵدا وەڵامی چەندین پرسیاری دووپاتبووی زۆری داوەتەوە و، بەم وەڵامدانەوە دووپات بووانەش ڕێنمایی چەندین چینی جۆراوجۆری قسە بۆکراوانی خەڵکیی کردووە. دەبینیت قورئان چەند ڕستەیەکی وا دووپات دەکاتەوە کە هەزاران بەرهەمیان هەیە و، چەند ڕێنماییەك

چەندین جار دەڵێتەوە کە ئەنجامی چەندەها بەڵگەی لەژمارەبەدەر و بێ سنوورن، ئەمەش لەو کاتەدا کە دەیەوێت: (ئەو ئاڵوگۆڕە گەورە و سامناکەی لە جیهاندا ڕوودەدەن و، ئەو کاولکاری و هەڵوەشانەوەیەی تووشی دنیا دێت و، بنیاتنانی دوارۆژی هەمیشەیی لە بریی دنیا دوای هەموو ئەمانە) لە مێشك و دڵی خەڵکیدا جێگیر بکات.

هەروەها قورئانی پیرۆز ئەو ڕستە و ئایەتانە لەو کاتانەشدا دووپات دەکاتەوە کە دەیچەسپێنێت هەموو شتە جوزئی و کوللی یەکان، هەر لە گەردیلەکانەوە تا ئەستێرەکان، لە ژێر دەستی یەك خوای تاك و تەنیادان. هەروەها لەو کاتانەدا دووپاتیان دەکاتەوە کە ڕق و خەشمی خوای پەروەردگار دەردەخات بەرامبەر بەو ستەمکارییانەی مرۆڤ دەیانکات کاتێك کە سنووری ئامانجی بەدیهێنان دەشکێنێت. ئەو ستەمکارییانەی کە ڕق و قین و هەڵچوونی ئاسمانەکان و زەوی و توخمەکانیان لە دژی ئەو ستەمکارانە دەوروژێنێت.

لەبەر ئەوە، دووپاتبوونەوەی ئەو ڕستە و ئایەتانە لە کاتی باسکردنی ئەو کارە گەورە و گرنگانەدا، هەرگیز بە ناتەواوی دانانرێت لە ڕەوانبێژیدا، بەڵکو ئیعجازێکە لەوپەڕی بێوێنەیی و جوانیدا و، ڕەوانبێژییەکە لەوپەڕی بەرزیدا و، ڕەوانکاری و فەصاحەتێکی یەکاویەکە لەگەڵ داخوازیی حاڵ و مەقامدا.

❖ بۆ نموونە:

ڕستەی: ﴿بسم الله الرحـــمن الرحيم﴾ تەنها یەك ئایەتە، سەد و چواردە جار لە قورئانی پیرۆزدا دووپات دەبێتەوە. چونکە وەك لە "بریسکەی چواردەهەم"دا ڕوونمان کردووەتەوە، ئەم ڕستەیە ڕاستییەکی گەلێ گەورەیە و، گەردوونی لە ڕووناکی پڕ کردووە و، بە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ عەرش و فەرشی بە یەکەوە بەستووە و، هەموو کەسێك لە هەموو کاتێکدا پێویستییەکی تەواوی بەو ڕاستییە هەیە. کەواتە ئەگەر ئەم ڕاستییە مەزنە ملیۆنان جاریش دووپات ببێتەوە، هێشتا ئەو پێویستییە هەر دەمێنێت و تێر نابێت. چونکە وەکو "نان" نییە تا پێویستییەکی ڕۆژانە بێت، بەڵکو وەك "هەوا" و "ڕووناکی" وایە کە لە هەموو خولەکێکدا مرۆڤ حەزی لێیەتی و پێویستی پێیەتی.

❖ ئایەتی: ﴿وإِنَّ ربَّكَ لَهُوَ العزيـــزُ الرَّحيـــم﴾ لە سوورەتی (الشعراء)دا هەشت جار دووپات دەبێتەوە. جا دووپات بوونەوەی ئەم ئایەتە مەزنەی کە هەزاران ڕاستیی تێدایە، لە سوورەتێکدا کە باسی ڕزگاربوونی پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - و ئازار و ئەشکەنجەی قەومەکانیان دەکات، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەیە کە:

ستەمکاریی قەومەکانیان بە ڕادەیەکی وایە کە دەم لە ئامانجی بەدیـهێنانی بەدیـهێنراوان و، مەزنیی پەروەردگاریێتی‌یە ڕەهاکەی خواوەند دەدات و خۆی تێ هەڵدەقورتێنێت. لەبەر ئەمە، عیززەتی پەروەردگاری داخوازی سزادانی ئەو قەومە ستەمکارانە دەبێت. کەواتە ئەگـەر ئـەم ئایەتـە هـەزاران جـاریش دووپـات ببوایەتـەوە، ئـەوا شــەوق و تاســەمەندیی مـرۆڤ بـۆی و پێویستیی پێی هێشتا هەر تەواو نەدەبوو. کەواتە دووپات بوونـەوە لـێرەدا بەلاغـەتێکی بـەرزی خاوەن ئیعجاز و ئیجازە.

❖ هەروەها کە ئایەتی: ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ﴾ لە سوورەتی (الرحـمن)دا و، ئایـەتی پیرۆزی: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ لـە سـوورەتی (المرسلات)دا دووپـات بوونەتـەوە، هەریەکـەیان ڕووەو هـەموو سـەردەم و چەرخـەکان هـاوار دەکـات و، بـە ئاشـکرا لـە هـەموو لایەکی ئاسمانەکان و زەوی‌دا ڕایدەگەیەنێت کە کوفری جینني و ئینس و ئینکاری‌کرنیان بۆ نیعمەتـە خوایی‌یـەکان و، سـتەمکاری‌یە لەڕادەبـەدەرەکانیان، خەشـم و قینـی بوونـەوەران دەهەژێنن و وا لـە زەوی و ئاسمانەکان دەکەن کە ڕقیان لێیان ببێتەوە و.. کوفرەکـەیان لەگـەڵ حیکمەت و مەبەستی بەدیهێنانی جیهاندا یەك ناکەوێت و، بە دەستدرێژی دادەنرێـت بۆ سـەر مـافی هـەموو بوونـەوەران بـە گشتی و، ئینکـاریی مـەزنیی خواوەنـد دەکـات و گاڵتـەی بـەو مەزنی‌یە دێت..

لەبەر ئەمانە، ئەم دوو ئایەتەی کە پەیوەندی‌یان بە هەزاران ڕاستیی وەك ئەمانەوە هەیە و بـە ئـەندازە و هـێزی هـەزاران مەسـەلەی تر گرنگی‌یـان هەیـە، ئەگـەر بـە هــەزاران جـاریش لـە گفتوگۆیەکدا کە ئاراستەی جینني و ئینس کرابێت دووپات بکرێنەوە، هێشـتا هـەر پێویستی بە دووپـات بوونەوەیان دەمێنێت. کـەواتە دووپات بوونـەوە لێرەدا ڕەوانبێژی‌یەکی کـورت و مـەزن و موعجیزەیەکی یەکجار جوانە.

❖ نموونەیەکی تر سەبارەت بە حیکمـەتی دووپـات بوونـەوە، لـە فـەرموودەی پێغەمبـەر ﷺ دەهێنینەوە:

لەو موناجاتەی پێغەمبەردا ﷺ کە بە: "الجوشن الكبير" بەناوبانگـە و، نـزا و پاڕانەوەیـەکی گەلـێ جوانـە و، نموونەیـەکی پوختـە کراوی هـەڵێنجراوی قورئـانی پیرۆزە، لـەم موناجاتــەدا ڕستەی: (سبحانك لا إله إلاّ أنت الأمان الأمان خلّصنا وأجرنا ونجنا من النـــار) سـەد جـار دووپات بووەتەوە. خۆ ئەگەر هەزاران جاریش دووپات ببوایەتەوە، ئەوا هەرگیز مرۆڤی بێزار نـەدەکرد، چونکـە ئـەم ڕستەیە گـەورەترین ڕاستیی گـەردوون کـە "تـەوحید"ە و، مـەزنترین فەرمانبـەریی بوونـەوەران بەرامبـەر پـەروەردگاری شـکۆمەندیان کــە بریتی‌یـە لــە تەسـبیح و تەحـمید و تەقدیس و.. مەزنترین کێشە و مەسەلەی چارەنووسـی مرۆڤایـەتی کـە ڕزگاربوونـە

لـە دەردی سـەریی هەمیشـەیی و ئـاگری دۆزەخ و.. پێویسـترین ئامـانج لــە بەندایــەتی و کۆڵەواریی مرۆڤدا کە نزا و پاڕانەوە و دوعایە.. هەموو ئەمانەی تێدایە.

بەم جۆرە، زۆر شتی هاوچەشنی ئەم بناغـە و بنچینانـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا دووپـات بـوونەتەوە، بە ڕادەیەکی وا کـە هـەندێ جار لە یەك لاپەڕەی موصحەفدا بیسـت جار زیـاتر - چ بە ڕاشکاوی و چ بە جۆرێکی ناوەکی - ڕاستیی "تـەوحید" دەردەبڕێـت. ئەمـەش بـەپێی داخوازیی مەقام و پێویستیی تێگەیاندن و بەلاغەتی ڕوونکردنەوە. جا بەم دووپات کردنەوەیە شـەوقی دووپـات کردنـەوەی خوێندنـەوەش دەجوولێنێـت و بەلاغەتەکـەی بـەهێز و بـەرزتر دەکات، بێ ئەوەی بێتاقەتی و بێزاری لە دەروونی مرۆڤدا بەجێ بهێڵێت.

بەشەکانی "پەیامەکانی نـوور" حیکمـەتی دووپاتبوونـەوەی نـاو قورئـانی پیرۆزیـان بـە جوانی باس کردووە و بەڵگەکانیشیان ڕوون کردوونەتەوە و چەسپاندوویانە کە ئەو دووپـات کردنەوەیە چەندە لەگەڵ بەلاغەتدا گونجاوە و، لە هەمان کاتدا چەند قەشەنگ و جوانیشە.

❖ حیکمەتی ئەو جیاوازییەش کە لە نێوان سوورەتە مەککی و مەدەنییـەکاندا هەیـە، لـە بارەی ڕەوانبێژییەوە، لە ڕووی ئیعجاز و بـەکورتی لێـدوان یـان درێژەپێدانـی ئـەو بابەتانـەی باسیان دەکەن، بەم جۆرەی خوارەوەیە:

پۆل و ڕیزی پێشەوەی نەیارەکانی قورئان لە مەککـەدا بـت پەرستەکانی قورەیـش بـوون، کـە نـەخـوێندەوار و بێ کتێب بـوون. لەبـەر ئەوە، ڕەوانبێـژی لـەوێ داخــوازی شێوازێکی بەرز و بەهێز و، کورتییەکی بە ئیعجازی قەناعـەت بـەخش و، دووپاتبوونەوەیـەکی وا بـوو کە بۆ جێگیرکردن و دامەزراندنی تێگەیاندنیان پێویست بێت. لەبەر ئەوە، زۆربەی سـوورەتە مەککییەکان پایەکانی ئیمان و پلەکانی تەوحیدیان بە شێوازێکی لەوپەڕی هـێز و بـەرزی و بە کورتییەکی تـابلێیی پڕ لـە ئیعجـازدا بـاس کـردووە و، ئیمـان بـەخوا و مـەبدەء و مـەعادیان دووپات کردووەتەوە، تەنانەت ئەو پایانەی ئیمانی بە (پێش‌خسـتن و دواخسـتن و، تـەعریف و تەنکیر و، حەزف‌کردن و باسکردن) لە هەموو لاپەڕە و ئایەتێکدا، یان لە یەك ڕستەدا، یان لـە یـەك وشـە، بـەڵکو لـە یـەك پیتـدا دەربڕیـوە و، پایـەکانی ئیمـانی لـەو چەشـنە حاڵـەت و شـێوە بەلاغییانەدا چەسپاندووە، بە چەشنێك کە پێشەوا و زانایانی بەلاغەتی لە بەردەم ئـەم شێوازە پڕ لە ئیعجازەدا حەپەساو و سەرسووڕماو کردووە.

پەیامـەکانی نـوور، بـە تایبـەتی وتـەی بیسـت و پێنجـەم (پـەیامی موعجـیزاتی قورئــانی و پاشـکۆکانی) چـل ڕووی ئیعجـازی قورئانیـان ڕوون کردووەتـەوە. هــەروەها تەفسـیری: "إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز" کە بە زمانی عــەرەبییە، بە چـەشـنێکی گەلـێ جـوان ئیعجازی قورئانی سەبارەت بـە هۆنینـەوەی نێـوان ئایەتـە پیرۆزەکـانی ڕوون کردووەتـەوە. بـە

ڕاستی ئه‌م دوو په‌یامه شێوازی ڕه‌وانبێژیی به‌رز و، كورتیی پڕ له‌ ئیعجازی قورئانیان چه‌سپاندووه‌.

به‌ڵام پۆل و ڕیزی پێشه‌وه‌ی نه‌یاره‌كانی ئایه‌ت و سووره‌ته‌ مه‌ده‌نی‌یه‌كان جووله‌كه‌ و گاوران بوون كه‌ خاوه‌ن كتێبن و ئیمانیان به‌ خوای گه‌وره‌ هه‌یه‌. له‌به‌ر ئه‌وه‌، ده‌ستووره‌كانی ڕه‌وانبێژی و شێوازه‌كانی ڕێنمایی و بناغه‌كانی ڕاگه‌یاندن داخوازی ئه‌وه‌ بوون كه‌ ئه‌و گوفتاره‌ی ئاراسته‌ی ئه‌و خاوه‌ن كتێبانه‌ ده‌كرێت له‌گه‌ڵ واقیعی حاڵیاندا گونجاو و یه‌كاویه‌ك بێت. ده‌بینیت شێوازی قورئان له‌ سووره‌ته‌ مه‌ده‌نی‌یه‌كاندا ئاسان و ڕوون و ڕه‌وانه‌ و، شته‌ جوزئی‌یه‌كان – نه‌ك بنچینه‌ و بناغه‌كانی ئیمان – ڕوون ده‌كاته‌وه‌. چونكه‌ هه‌موو حوكمه‌ فه‌رعی و یاسا هه‌مه‌كی‌یه‌كان له‌و شته‌ جوزئی‌یانه‌وه‌ په‌یدا ده‌بن و هه‌ر ئه‌وانن كه‌ ده‌بنه‌ خولگه‌ی ئیختیلافی نێوان ئه‌حكام و شه‌ریعه‌ته‌كان. له‌به‌ر ئه‌وه‌، ده‌بینیت زۆربه‌ی جار ئایه‌ته‌ مه‌ده‌نی‌یه‌كان ڕوون و ڕه‌وانن و له‌ شێوازێكی پڕ له‌ ئیعجازی تایبه‌ت به‌ قورئاندان.

به‌ڵام كاتێ كه‌ قورئان پوخته‌یه‌كی كورت و به‌هێز، یان ئه‌نجامێكی كورت كراوه‌، یان كۆتایی‌یه‌كی پته‌و، یان به‌ڵگه‌یه‌كی به‌هێزی گومانبڕ له‌ كۆتایی ڕووداوێكی جوزئی و فه‌رعی‌دا باس ده‌كات، ئه‌وا به‌مه‌ ئه‌و ڕووداوه‌ جوزئی‌یه‌ ده‌كات به‌ یاسا و ده‌ستوورێكی هه‌مه‌كی و گشتی. ئنجا بۆ مه‌به‌ستی ئه‌وه‌ش كه‌ گوێڕایه‌ڵی بۆكردن و به‌جێ‌هێنانی ئه‌و یاسا و ده‌ستوورانه‌ مسۆگه‌ر بكات "ئیمان به‌ خوا" له‌ ناخدا جێگیر ده‌كات. ئه‌م مه‌به‌سته‌ش ئه‌و كۆتایی‌یه‌ كورتانه‌ی ئایه‌ته‌كان كه‌ "ته‌وحید" و "ئیمان" و "دوارۆژ"یان تێدا كورت كراوه‌ته‌وه‌، ده‌یهێنێته‌دی. ئیتر ده‌بینیت ئه‌و مه‌قامه‌ ڕوون و ڕه‌وانه‌ به‌و كۆتایی‌یانه‌ی ئایه‌ته‌كان ڕووناك و به‌رز ده‌بێته‌وه‌.

(په‌یامه‌كانی نوور ڕاده‌ی بڵندیی ڕه‌وانبێژی و تایبه‌تكاری و جۆره‌كانی ڕه‌وانكاریی ورد و به‌رزی ئه‌و پوخته‌ و كۆتایی‌یانه‌ی ئایه‌ته‌كانی قورئانیان ڕوون كردووه‌ته‌وه‌ و، ئه‌مه‌یان بۆ سه‌رسه‌ختترین دوژمنیش چه‌سپاندووه‌. ئه‌وه‌ش له‌ "ده" دانه‌ تایبه‌تكاری و سه‌رنجدا كه‌ له‌ نووری دووهه‌می ڕۆشنایی دووهه‌می وته‌ی بیست و پێنجه‌مدایه‌، كه‌ تایبه‌ته‌ به‌ ئیعجازی قورئانه‌وه‌).

جا ئه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت له‌مه‌ تێ‌بگه‌یت، ئه‌وا فه‌رموو بڕوانه‌:

**﴿إِنَّ اللهَ على كُلِّ شيْءٍ قديرٌ﴾، ﴿إِنَّ اللهَ بكُلِّ شيْءٍ عليمٌ﴾، ﴿وهوَ العزيزُ الحكيمُ﴾، ﴿وهوَ العزيز الرحيم﴾..**

ئه‌مانه‌ و ئایه‌ته‌كانی تری هاووێنه‌یان كه‌ "ته‌وحید" ده‌گه‌یه‌نن و دوارۆژ ده‌خه‌نه‌وه‌ یاد و كۆتایی به‌ زۆربه‌ی ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌كانی قورئان ده‌هێنن، كه‌ بۆیان ده‌ڕوانیت، ده‌بیغیت قورئانی

پیرۆز لە کاتی باسکردنی حوکمە شەرعی و فەرعی‌یەکان و یاسا کۆمەڵایەتی‌یەکاندا سەری گوێبیستەکەی بەرز دەکاتەوە تاکو بڕوانێتە چەند ئاسۆیەکی هەمەکیی فراوان و، بەم کۆتایی‌یانە ئەو شێوازە ئاسان و ڕوون و ڕەوانە دەگۆڕێت بە شێوازێکی یەکجار بەرز و بڵند. وەك بڵێی خوێنەر لە دەرسی شەریعەتەوە بۆ دەرسی تەوحید دەگوێزێتەوە. ئەمەش ئەوە دەچەسپێنێت کە: "قورئان" هەروەك کتێبی بیروباوەڕ و ئیمانە، کتێبی شەرع و ئەحکام و حیکمەتیشە.. هەروەك کتێبی پاڕانەوە و بانگەوازە، هی زیکر و فیکریشە.

بەم چەشنە و، بەپێی جیاوازیی مەقام و جۆراوجۆریی ئامانج و مەبەستەکانی ڕێنمایی و ڕاگەیاندن، جۆرە ڕەوانی‌یەکی پڕ لە ئیعجازی ئاشکرا و درەخشان لە ئایەتە مەدەنی‌یەکاندا دەبینین، کە جیایە لە ڕەوانبێژیی ئایەتە مەککی‌یەکان. کاتی وا هەیە ئەم جۆرە ڕەوانبێژی‌یە لە دوو وشەدا دەبینیت وەك: (ربك) و (رب العالمين). چونکە بە تەعبیری: (ربك) ئەحەدییەت فێری خوێنەر دەکات: بەڵام بە: (رب العالمين) واحیدییەتی فێر دەکات. ئەوەش هەیە کە واحیدییەت ئەحەدییەتیشی تێدایە[1].

بەڵکو هەندێ جار ئەو جۆرە ڕەوانبێژی‌یە لە تەنها یەك ڕستەدا دەبینیت. بۆ نموونە: لە یەك ئایەتدا ئەوەت پیشان دەدات کە زانیاریی خوای گەورە دانانی گەردیلەیەك لە بیلبیلەی چاودا و، ڕێ و شوێنی ڕۆژ لەناو جەرگەی ئاسماندا دەگرێتەوە و، دەری دەخات کە توانستی خواوەند ئەوەندە گشتگیر (محيط)ە کە بە یەك ئامێر هەریەك لەوانە لە جێی خۆیدا دادەنێت و، ڕۆژ وەك چاوی ئاسمان لێ دەکات و، لە دوای ئایەتی: ﴿**يولِجُ الَّيلَ فِي النَّهارِ و يولِجُ النَّهارَ فِي الَّيل**﴾دا یەکسەر دەفەرموێ: ﴿**وهو عليمٌ بذاتِ الصُّدور**﴾ (الحديد:٦). واتە دوای باسکردن و خستنەڕووی مەزنیی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی، یەکسەر باسی ئەوە دەکات کە زانیاریی خوا شتانی پەنهانی ناو دەروونیش دەگرێتەوە. بەم کارەش ئەوە لە زەینی مرۆڤدا جێگیر دەکات کە خواوەند لە نێوان شکۆمەندیی بەدیهێنەرێتیی‌دا بۆ ئاسمانەکان و زەوی و، بەڕێوەبردن و تەگبیرکردنی کاروباریان، لە نێوان ئەمەدا، ئەو خواوەندە ئاگاداری

---

(١) واحیدییەت: ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو ناوەی خوای گەورە هەموو شتێك دەگرێتەوە. ئەحەدییەتیش ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو زیندەوەرێك ئاماژە بۆ هەموو ناوێکی خوا دەکات کە پەیوەندیی بە گەردوونەوە بێت. کەواتە درەوشانەوەی خوای گەورە بە "واحیدییەت" لەوەدایە کە دەورەدەرە بە هەموو شتێك، واتە هەموو شتێك دەگرێتەوە. بەڵام درەوشانەوەی بە "ئەحەدییەت" لەوەدایە کە هەرچی شت هەیە پیشانی هەرچی ناوی هەیە، دەدات. بڕوانە: "المثنوي العربي النوري" الطبعة المحققة الثانية ص٣٤٤ (وەرگێڕ هێناویەتی). (ولله المثـل الاعلى) یەکێتی ئەو ڕووناکی‌یەی دەوری خۆری داوە، ئاماژە بۆ "واحیدییەت" دەکات و، درەوشانەوەی ڕووناکیی خۆریش، بە هەموو تایبەتکاری‌یەکانیەوە، لە هەموو بەش و گەردیلەیەکی ئەو ڕووناکی‌یەی کە دەوری خۆی داوە، هێمایە بۆ "ئەحەدییەت". جا فەرموو بیری لێ بکەرەوە. "المثنوي العربي النوري" ص ٢١١. (وەرگێڕ هێناویەتی)

خـه‌یاڵ و ختـووره‌ و شـته‌ شـارراوه‌ و په‌نـهان و نادیاره‌كـانی نـاو دڵ و ده‌روونـی هـه‌موو كه‌سێكیشه‌. كه‌واته‌ به‌دواهاتنی: ﴿وهو عليمٌ بـذاتِ الصُّـدور﴾ دوای ئـه‌و ئایه‌تـه‌، جۆره‌ ڕه‌وانكاری‌یه‌كی وایه‌ كه‌ ئه‌و شێوازه‌ ئاسان و ڕوون و سروشتی و نزیك لـه‌ تێگه‌یشتنی عه‌وامه‌، ده‌گۆڕێت به‌ ڕێنمایی‌یه‌كی به‌رز و ڕاگه‌یاندنێكی سه‌رنج ڕاكێش و گشتی.

**پرسیار:**

سه‌یر كردنی سه‌رپێ‌یی و ساكارانه‌ ناتوانێت ئه‌و ڕاستی‌یه‌ گرنگانه‌ ببینێت كه‌ قورئانی پیرۆز ده‌یانهێنێت. ئه‌وه‌تا نازانێت له‌ نێوان پوخته‌یه‌كی كۆتایی‌هێنه‌ری ئه‌وتۆ كه‌ تـه‌وحیدێكی به‌رز ده‌رببڕێت یان ده‌ستوورێكی هه‌مـه‌كی بگه‌یه‌نێت و.. ڕووداوێكـی هـه‌نده‌كیی ئاسایی‌دا كه‌ ئایه‌تێك باسی كردبێت، چ جۆره‌ موناسه‌به‌ت و په‌یوه‌ندی‌یه‌ك هه‌یـه‌. له‌به‌ر ئـه‌وه‌، هـه‌ندێ كـه‌س وا گومـان ده‌بـات كـه‌ هـه‌ندێ ناتـه‌واویی ڕه‌وانبێـژی لـه‌م ڕووه‌دا هه‌یـه‌. بـۆ نموونـه‌: موناسه‌به‌ت و ڕه‌وانبێژی له‌ باسی یاسایه‌كی مه‌زن و گرنگی وه‌ك: ﴿وفَوْقَ كُـلِّ ذي عِلْـمٍ عَليمٌ﴾ ده‌رناكه‌وێت كه‌ له‌ پاش ڕووداوێكی هه‌نده‌كی هێنرابێت، وه‌ك ئـه‌وه‌ی كـه‌ حـه‌زره‌تی یووسف - دروودی له‌سه‌ر بێت - به‌ ته‌گبیرێكی زیره‌كانه‌ براكه‌ی لای خۆی گل دایه‌وه‌. جا ئومێد وایه‌ ئه‌و نهێنی‌یه‌ ڕوون بكه‌نه‌وه‌ و، په‌رده‌ له‌ ڕووی ئه‌و دانسته‌ لابده‌ن.

**وه‌ڵام:**

زۆربه‌ی سووره‌ته‌ درێژ و مامناوه‌ندی‌یه‌كان، كـه‌ هه‌ریه‌كـه‌یان قورئـانێكی سـه‌ربه‌خۆیه‌ بۆ خۆی، ته‌نها به‌ دوو یان سێ دانه‌ له‌ چـوار مه‌به‌سته‌كانی قورئـان واز نـاهێنێت كه‌ بریتین لـه‌: "ته‌وحید، نبووه‌ت، حه‌شر، عه‌داله‌ت له‌گـه‌ڵ عبوودییـه‌ت". بـه‌ڵكو هه‌ریـه‌ك لـه‌و سووره‌تانه‌ پوختـه‌ و كاكڵـه‌ی هـه‌موو قورئـان و هـه‌ر چـوار مه‌به‌سـته‌كه‌ی تێدایـه‌. واتـه‌ هه‌ریـه‌ك لـه‌و سووره‌تانه‌: هـه‌روه‌ك كتێبـی شـه‌ریعه‌ت و دانسـت و ڕێنمایی‌یـه‌، كتێبـی زیكـر و فیكریشـه‌ و، هه‌ریه‌كه‌یان چـه‌ندین كتێبـی تێدایـه‌ و ڕێنمـایی مـرۆڤ بـۆ چـه‌ندین ده‌رسـی جیاجیـا ده‌كـات. ده‌بینین هه‌موو پله‌یه‌كی به‌ڵكو هه‌موو لاپه‌ڕه‌یه‌كی، چه‌ندین ده‌رگای ئیمان له‌ بـه‌رده‌م مرۆڤـدا ده‌كاته‌وه‌ و، لـه‌ هـه‌مان كـاتدا چـه‌ند مه‌به‌سـت و ئامانجێكیشـی پێ داده‌مـه‌زرێنێت، چونكـه‌ ئه‌وه‌ی له‌ كتێبی نووسراوی گه‌ردووندا نووسراوه‌، قورئان به‌ ڕوونی باسـی ده‌كـات، به‌مـه‌ش لـه‌ نـاخی ئیمـانداردا ئـه‌وه‌ جێگیر ده‌كـات كـه‌ پـه‌روه‌ردگاریتیی خـواوه‌نـد هـه‌موو شـتێكی گرتووه‌ته‌وه‌ و دره‌وشانه‌وه‌ هه‌یبه‌تداره‌كه‌شی له‌ ئاسۆ و ده‌روونه‌كاندا پیشان ده‌دات..

له‌به‌ر ئـه‌وه‌، ئه‌گـه‌ر ده‌توانیـت سـه‌رنج لـه‌و موناسـه‌به‌ته‌ بده‌یـت كـه‌ بـه‌ ڕواڵـه‌ت لاواز ده‌رده‌كه‌وێت و، توانیت به‌ وردی سه‌یری پشتی په‌رده‌ كـه‌ی بكـه‌یت، ئـه‌وا ئـه‌و په‌رده‌یـه‌ت لـه‌ به‌رده‌مدا لاده‌چێـت و، ئـه‌و ئاسـۆ فـراوان و ده‌رس و ڕێنمایی‌یـه‌ نوێیانـه‌ی كـه‌ ئـه‌و په‌رده‌یـه‌

شـاردبوونیەوە، دەردەکـەون. بـەڵکو شـتی وا دەبینیـت کـە چـەندین ئامـانج و مەبەسـتی هەمەکی‌یان لەسەر بنیات دەنرێت، ئیتر یـەك لـە دوای یـەك چـەندین جۆری پـەیوەندیی بـەهێز لەگەڵ ئەو موناسەبەتەدا کە بە ڕواڵەت لاواز دیار بوو، دەردەکەون. ئـەو کاتـە شـێوازەکە بـە تەواوی لەگەڵ ئەو مەقامەدا یەکاویەك دەردەچێت و، بەمەش پلەی ڕەوانبێژی‌یەکەی پتر بـەرز دەبێتەوە.

**پرسیارێکی تر:**

چ دانایی‌یەك لەوەدا هەیە کە قورئان هەزاران بەڵگە بۆ چەسپاندنی کاروبـاری دواڕۆژ و، تەوحید و، گەڕانەوەی مرۆڤ بۆ لای خوا و، پاداشتدانەوەی، دەهێنێتەوە؟.. هەروەها دانایی چی‌یە لـەوەدا کـە هـەموو سـوورەت و لاپەڕەیـەکی موصحـەف لـە هـەموو مـەقامێکدا، چ بـە ڕاشکاوی و ڕاستەوخۆ چ بە بە جۆرێکی ناوەکی(ضِمني) چ بە ئاماژەکردن، سەرنجی مـرۆڤ بۆ لای ئەوانەی باس کران ڕادەکێشێت؟

**وەڵام:**

چونکە قورئانی پیرۆز مرۆڤ ئاگادار دەکاتەوە کـە: مـەزنترین گۆڕانکـاری و ئـاڵوگۆڕی مێژووی جیـهان کـە لـەناو بەدیـهێنراوان و بازنـەی "مومکینـات"دا ڕوو دەدات: قیامەتـە.. هەروەها ڕێنمـایی ئـەم مرۆڤـە - کـە هـەڵگری پلـەی جێنشینیی سـەر زەوی‌یـە - دەکـات بـۆ مـەزنترین مەسـەلەی ئـەوتۆ کـە پـەیوەندیی بـە مرۆڤـەوە بیێـت، کـە مەسـەلەی "تـەوحید"ە و، بەختەوەریی هەمیشەیی یان سەر لـێ تێکچوونی هەمیشەیی لەسەر بەندە. لـە هـەمان کاتیشـدا ئـەو لافـاوی گومانـە بەردەوامـەی پـێ دەباتـە دواوە و، توندتریـن جۆرەکـانی ئینکـاری و سەرسەختیشی پێ تێکدەشکێنێت.

لەبەر ئەوە، ئەگـەر قورئـانی پیرۆز هـەزاران جـار سـەرنجی مـرۆڤ بـۆ لای ئیمـان بـەو ئـاڵوگۆڕە سەرسووڕهێنەرانە ڕابکێشێت و، وا لـە خـەڵکی بکـات تەسـدیقی ئـەو مەسـەلە گرنگ و پێویستەی مرۆڤ بکەن و، ملیۆنان جاریش ئەو مەسەلانە دووپـات بکاتـەوە، هێشتا ئەم کارە لە ڕەوانبێژی‌دا هەرگیز بە زیادەڕەوی دانانرێت و بە هیچ جۆرێك بێتاقەتی و بێزاری بۆ مرۆڤ فەراهەم ناهێنێت، بەڵکو پێوستیی مرۆڤ بە دووپـات کردنـەوەی خوێندنـەوەیان لـە قورئـاندا هـەرگیز تـەواو نـابێت. چونکـە لـە هـەموو "وجـوود"دا هیـچ مەسـەلەیەك نی‌یـە لـە "تەوحید" و "ئاخیرەت" گەورە و گرنگتر بێت.

بۆ نموونە:

**﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحاتِ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِها الأَنْهارُ ذلِـــكَ الْفَــوْزُ الْكَبِيرُ﴾** (البروج:١١).

ڕاستیی ئەم ئایەتـە پیرۆزە بریتی‌یە لـە مژدەی ژیـانی هەمیشـەیی کـە ئـەم ئایەتـە بـەم مرۆڤـە هەژارەی دەدات، ئەم مرۆڤەی کە هـەموو دەمێـك مـردن ڕووبـەڕووی ڕادەوەستێت. جـا ئـەم مژدەیە لـەوە ڕزگاری دەکات کە مـردن بـە لەناوچـوونێکی هـەمیشـەیی لێـك بداتـەوە و. خـۆی و جیهانەکەی و هەموو خۆشەویستانی لە چنگی لەناوچوون ڕزگـار دەکـات، بـەڵکو لەوەش زیاتر، دەستەڵات و بەختەوەرییەکی هەمیشەیی پێ دەبەخشێت.. کەواتـە ئەگـەر ئـەم ئایەتە پیرۆزە ملیار جاریش دووپات ببێتەوە، ئەوا هەرگیز بـە زیـادەڕەوی دانـانرێت و بـە هیـچ جۆرێك ڕەوانبێژیی قورئان زامدار ناکات.

بەم جۆرە دەبینیت قورئانی پیرۆز، کە چارەسەریی ئەم جۆرە مەسەلە گرنگانە دەکات و بە دانـانی چـەند بەڵگەیـەکی بـەهێز هـەوڵ دەدات قەناعـەت بەوانـە ببەخشـێت کـە لەگـەڵیاند دەدوێت، ئەم قورئانە، لە زەیـن و دڵ و دەروونـەکاندا ئـەو ئـاڵوگۆڕە مەزنانـەی گـەردوون بـە قووڵی جێگیر دەکات و لە بەرچاویاندا وەك گۆڕانی خانە و لانە و شـکڵ و شـێوەیان ئاسـانی دەکـات. کەواتـە سـەرنج ڕاکێشـانی مـرۆڤ بـە هـەزاران جـاریش بـۆ لای هاوچەشـنی ئـەم مەسەلانە – ئەم سەرنج ڕاکێشانەش چ بـە ڕاشـکاوی بێـت و چ بـە جۆرێکـی نـاوەکی و چ بـە ئاماژە بۆ کردن – کارێکی یەکجار پێویستە و وەك پێویستیی مـرۆڤ وایـە بـۆ نیعمـەتی نـان و هەوا و ڕووناکی، کە چەند پێویستی‌یەکی ئەوتۆن هەمیشە دووپات دەبنەوە.

نموونەیـەکی تـر: حیکمـەتی ئـەوەی کـە قورئـانی پیـرۆز: ﴿**والَّذيـن كَفَـرُوا لَـهُمْ نـارُ جَهَنَّمَ**﴾(فاطر:٣٦) و ﴿**إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذابٌ أَليم**﴾ (إبراهيم:٢٢) و هاوچەشـنیان لـەو ئایەتانـە کـە بـە شـێوازێکی زۆر تونـد و تیـژ هەڕەشـە و گـوڕەشـەیان تێـدا دووپـات دەکاتـەوە (وەك بـە چەشنێکی گومانبڕ لە پەیامەکانی نووردا چەسپاندوومانە) ئەوەیە کە:

کـافربوونی مـرۆڤ: سنوورشـکاندن و دەسـتدرێژی کردنـە بـۆ سـەر مـافی بوونـەوەران و زۆربەی بەدیهێنراوان. ئەمەش ڕقی ئاسمانەکان و زەوی دەوروژێنێت و دەروونی توخـمەکان بەرامبەر بە کافران پڕ لـە ڕق و قـین دەکـات، بـە ڕادەیـەکی وا کـە توخـمەکانی بوونـەوەر بـە زللـەی: "تۆفـان" و شـتی تریـش لـەو کافرانـە دەدەن، تەنانـەت دۆزەخـیش هێنـدە ڕقـی هەڵدەستێت کە وەختە لەتاوا لەتوپەت ببێت، وەك ڕاشکاویی ئایەتی پیرۆزی: ﴿**إِذا أُلْقُوا فيها سَمِعُوا لَها شَهيقاً وَهِيَ تَفُورُ ۞ تَكادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظ**...﴾ (الملك:٧-٨) ئەمە دەردەبڕێت.

جـا ئەگـەر خـواوەنـدی پادشـای گـەردوون لـە فەرمانـەکانیدا هـەزاران، بـەڵکو ملیۆنـان جاریش ئەو تاوانە گەورەیەی کوفر و تۆڵەکەی بە شێوازێکی زۆر توندوتیژ دووپات بکاتەوە، هێشتا ئەمە لە ڕەوانبێژیدا بە زیـادەڕەوی و ناتـەواوی دانـانرێت، لەبـەر گـەورەیی ئـەو تاوانـە گشتی و دەسـتدرێژی‌یە بێ سنوورەی کە کوفر بۆ سەر مافی بوونەوەران دەیکات و، لەسەر

بناغەی دانایی ڕوونکردنەوەی گرنگیی مافی ئەوانەی لە ژێر فەرمانی خواداان و، لەبەر دەرخستن و زەق کردنی ئەو ناشیرینییە لەبن‌نەهاتووەی کە لە کوفری ئینتکاری کەران و ستەمە تەواو ناشیرینەکەیاندا هەیە. چونکە ئەو دووپات بوونەوەیە لەبەر بچووکی و بێ‌نرخیی مرۆڤ نییە، بەڵکو بۆ دەرخستنی گەورەیی ئەو لەسنووردەرچوونەی کافران و ستەمکارییەکەیانە.

پاشان دەبینین وا هەزار و سەدان ساڵە سەدان ملیۆن کەس بەوپەڕی شەوق و تاسەمەندی و هەست کردنەوە بە پێویستی و، بێ ئەوەی بێتاقەت و بێزار ببن، قورئانی پیرۆز بە بەردەوامی دەخوێننەوە.

بەڵێ، لە ڕاستیدا هەموو ڕۆژ و کاتێك جیهانێکە دێت و دەڕوات و، دەرگایەکە لە ڕووی جیهانێکی نوێ دەخرێتە سەرپشت. لەبەر ئەوە، هەزاران جار دووپات کردنەوەی "لا إله إلا الله" بەو شەوقەی کە هەست بە پێویستی پێ‌بوونی بکرێت، تاکو ئەو هەموو جیهانانەی کە هەردەم لەسەر ڕێن و دێن و دەڕۆن بە نووری ئەو ئیمانە ڕووناك ببنەوە، وا لەو ڕستە تەوحیدییە دەکات وەکو چرایەکی ڕووناکی‌بەخش وابێت لە ئاسمانی ئەو جیهان و ڕۆژانەدا.

خۆ مادەم ئەمە لە "لا إله إلا الله"دا وایە، دووپات کردنەوەی قورئانی پیرۆزیش، بە هەمان جۆر، ئەو تاریکییە دەڕەوێنێتەوە کە بەسەر بەشی زۆری ئەو دیمەنە هاتوچۆکەر و جیهانە ڕەوەند و سەرلەنوێ پەیدابووانەدا باڵی ڕاکێشاوە. هەروەها ئەو ناشیرینییانەش لەو وێنانەدا لا دەبات کە لە ئاوێنەی ژیاندا ڕەنگ دەدەنەوە و، وا لەو بارودۆخانەش دەکات کە بەرەو ڕووی دێن، لە قیامەتدا شایەتیی بۆ بدەن نەك شایەتیی لە دژ بدەن و (هەر ئەم دووپات بوونەوەیەی خوێندنی قورئان) پلەی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە تا دەیگەیەنێتە ئەو پلەیەی کە گەورەیی تۆڵەی تاوانەکان بزانێت چەندەیە و، لە هەڕەشەی سامناکی پادشای ئەزەلیش تێ‌بگات کە سەرپێچیی ستەمکارە سەرسەختەکان لەتوپەت دەکات و.. مرۆڤ دەخاتە شەوقی ئەوەی کە هەوڵ بدات لە دەست ستەم و سنوورشکاندنی دەروونی بەدخوازی، خۆی ڕزگار بکات.

جا لەبەر هەموو ئەم دانستانەیە کە قورئانی پیرۆز بەوپەڕی داناییەوە ئەو شتانە دووپات دەکاتەوە و، بەمەش دەری دەخات ئەو هەڕەشە زۆر و زەبەندانەی کە تا ئەم ئەندازەیە و بەم هێز و توندوتیژی و دووپات بوونەوەیەن کە باسمان کردن، ڕاستییەکی گەلێ گەورەیە و،

شه‌یتانیش هه‌ڵدێت له‌وه‌ی كه‌ به‌ نارِه‌وا و گاڵته‌ی بزانێت. به‌ڵێ، سزای دۆزه‌خ بۆ ئه‌و كافرانه‌ی گوێ بۆ هه‌ڕه‌شه‌كان ڕاناگرن، كارێكه‌ یه‌كپارچه‌ دادگه‌ری‌یه‌.

❖ یه‌كێكی تر له‌و شتانه‌ی كه‌ قورئان دووپاتیان ده‌كاته‌وه‌، چیرۆكی پێغه‌مبه‌رانه‌، علیهم السلام.

بۆ نموونه‌: دانایی له‌ دووپات بوونه‌وه‌ی چیرۆكی حه‌زره‌تی مووسادا – علیه السلام – (كه‌ به‌ ئه‌ندازه‌ی عه‌سای مووسا دانست و سوودی تیدایه‌) و، حیمكه‌تی دووپات بوونه‌وه‌ی چیرۆكی پیغه‌مبه‌ران – درووديان له‌سه‌ر بێت – بریتی‌یه‌ له‌ چه‌سپاندنی پێغه‌مبه‌رێتیی پێغه‌مبه‌رمان ﷺ ئه‌مه‌ش به‌ ده‌رخستنی ئه‌وه‌ی كه‌ پیّغه‌مبه‌رێتیی هه‌موو پێغه‌مبه‌ران به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ "ڕیساله‌تی ئه‌حمه‌دی" ڕاسته‌ و له‌ هه‌موویان حه‌قتر و شایانتره‌ بۆ شوێنكه‌وتن. چونكه‌ مه‌گه‌ر یه‌كێك ئینكاریی پێغه‌مبه‌رێتیی هه‌موو پێغه‌مبه‌ران بكات، ده‌نا مومكین نی‌یه‌ ئینكاریی پێغه‌مبه‌رایه‌تیی حه‌زره‌تی محه‌ممه‌د ﷺ بكات. كه‌واته‌ باسكردنی چیرۆك و به‌سه‌رهاتی ئه‌وان به‌ڵگه‌ی پێغه‌مبه‌رێتیی حه‌زره‌تی محه‌ممه‌دن ﷺ.

پاشان به‌شێكی زۆری خه‌ڵك ناتوانن و، هه‌موو كاتێك بۆیان ناره‌خسێت كه‌ قورئانی پیرۆز بخوێننه‌وه‌، به‌ڵكو چه‌نده‌یان بۆ لوا به‌وه‌نده‌ وازده‌هێنن. ئا لێراده‌ حیكمه‌تی ئه‌وه‌ به‌ جوانی ده‌رده‌كه‌وێت كه‌ هه‌موو سووره‌تێكی درێژ و مامناوه‌ندی له‌ بریی قورئانێكی بچووككراوه‌ن. ئنجا دووپات كردنه‌وه‌ی چیرۆكه‌كانیش وه‌ك دووپات بوونه‌وه‌ی پایه‌كانی ئیمان وایه‌ كه‌ پێویستیان به‌ دووپات بوونه‌وه‌ هه‌یه‌. واته‌: ڕه‌وانبێژی داخوازی دووپات بوونه‌وه‌ی ئه‌م چیرۆكانه‌یه‌ و هیچ زیاده‌ڕه‌وی‌یه‌ك له‌م كاره‌دا نی‌یه‌. له‌مه‌ش زیاتر، ئه‌م دووپات بوونه‌وه‌یه‌ تێمانده‌گه‌یه‌نێت كه‌ ڕوودانی په‌یدابوون و سه‌رهه‌ڵدانی حه‌زره‌تی محه‌ممه‌د ﷺ گه‌وره‌ترین ڕووداوی مرۆڤایه‌تی و شكۆمه‌ندترین مه‌سه‌له‌ی نێوان مه‌سه‌له‌كانی گه‌ردوونه‌.

به‌ڵێ، كه‌ زاتی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ به‌رێزه‌ ﷺ مه‌زنترین و به‌رزترین پله‌ی له‌ قورئاندا دراوه‌تێ و (محمد رسول الله)یش، كه‌ چوار پایه‌ی له‌ پایه‌كانی ئیمان تێدایه‌، له‌گه‌ڵ (لا إله إلا الله)دا به‌یه‌كه‌وه‌ ده‌وترێن، به‌ڵگه‌یه‌كی گه‌لێ گه‌وره‌ و بێوێنه‌یه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ پێغه‌مبه‌ریی حه‌زره‌تی محه‌ممه‌د ﷺ گه‌وره‌ترین ڕاستیی ناو گه‌ردوونه‌ و، به‌رێزترینی هه‌موو به‌دیهێنراوانه‌ به‌ گشتی و، "حه‌قیقه‌تی محه‌ممه‌دی"ش – كه‌ بریتی‌یه‌ له‌ كه‌سێتی‌یه‌ مه‌عنه‌وی و هه‌مه‌كی‌یه‌كه‌ی ئه‌و ﷺ – چرای ڕووناكی‌به‌خشی هه‌ردوو جیهانه‌كه‌یه‌ و، ئه‌م پێغه‌مبه‌ره‌ش شایان و شیاوی ئه‌م پله‌وپایه‌ ده‌راسایه‌یه‌، وه‌ك به‌ چه‌ندین به‌ڵگه‌ی جۆراوجۆر له‌ به‌شه‌كانی په‌یامه‌كانی نووردا چه‌سپێنراوه‌. وا لێره‌شدا و له‌ نێوان هه‌زار به‌ڵگه‌دا یه‌ك به‌ڵگه‌ ده‌هێنین و به‌م جۆره‌ی خواره‌وه‌ باسی ده‌كه‌ین:

بەپێی دەستووری: "السبب كالفاعل" بە ئەندازەی هەرچی كردەوەی چاكی نەتەوەكەی حەزرەتی محەممەد هەیە ﷺ لە هەموو كات و سەردەمێكدا لە لاپەڕەی چاكەكاریەكانی پێغەمبەردا ﷺ كردەوەی چاكە دەنووسرێت.

ئنجا ئەو پێغەمبەرە ﷺ بەو نوورەی كە هێناویەتی، ڕاستییەكانی بوونەوەران ڕووناك دەكاتەوە. بەم كارەشی نەك تەنها جیننی و ئینس و مەلائیكەت و زیندەوەران دەخاتە سوپاسگوزاری و ڕەزامەندییەوە، بەڵكو هەر هەموو گەردوون و ئاسمان و زەوی بە گشتی ڕەزامەندیی خۆیان لە بەرامبەریەوە دەردەبڕن و، دەماودەم بە هەموو جۆرێك ڕەوشتبەرزییەكانی ئەو پێغەمبەرە ﷺ دەگێڕنەوە و باسی دەكەن.

ئنجا بە نیشانەی ئەوەی كە دوعای ڕووەكەكان بە زمانی ئامادەیی و قابیلییەتیان و، هی زیندەوەران كە بە زمانی سروشت دەیكەن، بە چاو دەیبینین كە هەرهەموویان گیرا دەبن.. بەمەدا دەردەكەوێت كە ملیۆنەها نزای گیرا و سروشتیی ملیۆنەها پیاوچاكی نەتەوەكەی ئەو پێغەمبەرەش ﷺ لەگەڵ ڕۆحانییەكاندا، بە هەمان جۆر، گیرا دەبن.

جا ئەم دوعا و نزایانەی كە ئەو ئەولیا و پیاوچاكانە بەردەوام هەرچی ڕۆژە دەیانكەن و، دوعای ڕەحمەت بۆناردنی بە صەلات و سەلام لێكردنی دەینێرن و، دەستكەوتە مەعنەوی و كردەوە چاكەكانیان، هەموو ئەوانە، لە پێشدا پێشكەش بەو پێغەمبەرە ﷺ دەكرێن. سەرەڕای ئەو نوورە زۆر و لە سنووربەدەرەی كە لە قورئان خوێندنەوەی نەتەوەكەیەوە دەچێتە ناو دەفتەری كردەوە چاكەكانیەوە. ئەو قورئانە پیرۆزەی كە هەر پیتێك لە پیتەكانی - كە لە سێ سەد هەزار پیت زیاترن - (دە) چاكە و دە بەروبوومی دوارۆژ، بەڵكو (سەد)، بەڵكو (هەزار) بۆ خوێنەرەكەی دەنووسرێت.

بەڵێ، خواوەندی زانای پەنهان، زووتر دەیزانی و دەیبینی: "حەقیقەتی محەممەدی" - كە كەسێتیی مەعنەویی ئەو زاتە پیرۆزەیە ﷺ - وەكو نموونەی درەختی "تووبا"ی بەهەشت وایە. لەبەر ئەوە، لە قورئانەكەی خۆیدا ئەو گرنگییە مەزنەی پێ داوە، چونكە هەر ئەوە لە هەموو كەسێك شایانتری ئەو پلەوپایە بەرزە بێت. ئەو خواوەندە لە فەرمانەكانیدا ئەوەی ڕوون كردووەتەوە كە دەستكەوتنی شەفاعەتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ تەنها بە شوێنكەوتن و گوێڕایەڵی و شوێنپێ هەڵگرتنی سوننەتی پیرۆزی ئەو دەبێت و، هەر ئەوە كە گەورەترین مەسەلەكانی نێوان مرۆڤ بێت. بەڵكو قورئانی پیرۆز جارجار بایەخی بە لایەنە مرۆڤانەكەشی داوە، كە وەك تۆوی درەختی "تووبا"ی بەهەشت وایە.

جا لەبەر ئەوەی كە ڕاستییە دووپاتبووەكانی قورئان ئەم نرخە بەرزانەیان هەیە و ئەو هەموو دانستەیان تێدایە كە باس كران، ئەوا سروشتی ساغ و بێعەیب و تەواوی مرۆڤ

شایه‌تی له‌سه‌ر ئه‌وه ده‌دات كه دووپات بوونه‌وه له قورئاندا، موعجیزه‌یه‌كی به‌هێز و فراوانه. مه‌گه‌ر یه‌كێك به تاعوونی ماددییه‌ت دڵ و ویژدانی نه‌خۆش كه‌وتبێت. ئه‌و جۆره كه‌سانه‌ش ئه‌م ده‌ستووره به‌ناوبانگه ده‌یانگرێته‌وه كه ده‌ڵێت :

قد تنكِرُ العينُ ضوءَ الشمس من رمدٍ        وينكرُ الفم طعمَ الماءِ من سقَمِ(١)

* * *

## كۆتاییه‌ك له دوو په‌راوێزدا

**په‌راوێزی یه‌كه‌م:**

دوازده ساڵ پێش ئێستا به‌رگوێم كه‌وت كه: زه‌ندیقێكی سه‌رسه‌خت ده‌روونی خراپ و مه‌به‌ستی پیسی خۆی ئاشكرا كردووه به‌وه‌ی كه قورئانی پیرۆزی وه‌رگێڕاوه. به‌م هه‌وڵدانی وه‌رگێڕانه‌ی قورئانیش پلانێكی ترسناكی بۆ ڕێزنه‌هێشتنی قورئان ساز كردووه و، وتوویه‌تی: با قورئان وه‌ربگێڕرێت تاكو نرخه‌كه‌ی ده‌ربكه‌وێت. به خه‌یاڵی خۆی گوایا: با خه‌ڵكی دووپات بوونه‌وه ناپێویسته‌كانی ببینن و، له بریی خۆی وه‌رگێڕراوه‌كه‌ی بخوێننه‌وه... هتد له‌م بیروڕا ژه‌هراوی‌یانه.

به‌ڵام به فه‌زڵی خوای گه‌وره، په‌یامه‌كانی نوور به‌هۆی به‌ڵگه به‌هێزه ده‌مكوت كه‌ره‌كانی و بڵاوبوونه‌وه‌ی به جۆرێكی فراوان له هه‌موو شوێنێكدا، ئه‌و بیر و پلانه‌ی ئه‌وی له‌باربرد و په‌كی خست و، به چه‌شنێكی گومانبڕ چه‌سپاندوویه‌تی كه: هه‌رگیز له توانادا نی‌یه به جۆرێكی ڕاسته‌قینه قورئانی پیرۆز وه‌ربگێڕرێت و، هه‌ر زمانێكی تری جگه له زمانی عه‌ره‌بیی فوصحا هه‌رگیز ناتوانێت تایبه‌تكاری و سه‌رنجه ورد و ناسكه ڕه‌وانبێژی‌یه‌كانی قورئان بپارێزێت و، ئه‌و وه‌رگێڕراوه ساده و جوزئی‌یانه‌ی كه مرۆڤ ده‌یانكه‌ن، به هیچ حاڵێك جێی ته‌عبیره پڕ و تۆكمه و ئیعجازبه‌خشه‌كانی قورئان ناگرنه‌وه، كه له هه‌ر پیتێكی‌دا له "ده"وه تا "هه‌زار" چاكه‌ی تێدایه. له‌به‌ر ئه‌وه، هه‌رگیز مومكین نی‌یه له بریی خۆی وه‌رگێڕراوه‌كه‌ی بخوێنرێته‌وه.

به‌ڵام سه‌ره‌ڕای ئه‌مه، ئه‌و مونافیقانه‌ی كه قوتابیێتیی ئه‌و زه‌ندیقه‌یان كردبوو، له پێناوی شه‌یتاندا چه‌ند هه‌وڵێكی هه‌ڵه‌شانه‌یان دا، تاكو به ده‌م وپلی خۆیان نووری قورئانی پیرۆز بكوژێننه‌وه.. جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی من كه‌س نابینم و تێكه‌ڵی خه‌ڵكی ناكه‌م، ئه‌وا ڕاستیی ئه‌و

---

(١) واته به‌هۆی چاوێشه‌وه هه‌ندێ جار چاو ئینكاریی ڕووناكیی خۆر ده‌كات و، به‌هۆی نه‌خۆشی‌شه‌وه ده‌می مرۆڤ ئینكاریی تامی ئاو ده‌كات. ئه‌م شیعره هی ئیمامی بوصیری‌یه. بڕوانه: "بردة المديـــح" الفصـــل الســـادس. (وه‌رگێڕ)

شتانەی لە بارودۆخی دەرەوەدان نـازانم و لـە بارەیانـەوە ئاگـادار نیـم. بـەڵام زیـاتر وا گومـان دەبەم کە ئەمەی ئێستا باسم کرد بوو بەهۆی نووسینی مەسەلەی دەهەم، هەرچەندەش لە هەموو لایەکەوە تەنگانە دەورەی دابووم.

**پەراوێزی دووهەم:**

ڕۆژێکیـان، دوای بـەربوونمان لـە بەندیخانـەی "دەنـیزلی" لـە نـهۆمی سـەرەوەی ئوتێلـی "شـەهر"دا دانیشتبووم و سەرنجی ئەو دار چنارە زۆرانەم دەدا کە لەناو باخچـە و بێسـتانە دڵڕفێنەکانی دەوروبەرمدا بوون. بینیم ئەو درەختانـە بـەو جموجووڵ و لەنجە و لارەی کە لە بنەوە تا لـق و پەلـەکانیان دەیـانـنواند، دڵخۆش دیـارن و هـەر کـە بـە ئاسـتەم سـروەیەکیان بەردەکەوێت، یەکسـەر گـەڵاکانیان دەلەرێنـەوە. بـەم جـۆرە ئەو درەختانـەم لـە جوانـترین و شیرینترین شێوەدا هاتە پێش چاو، وەك ئـەوەی لـە ئەڵقـەی زیکـر و تەهلیلـەدا خـەریکی تەسبیحاتی خواوەند بن.

ئەم جموجووڵـە ناسکانە، دەستکاریی ژێیەکانی دڵیـان کـردم، لـەو کاتـەدا کـە دڵـم لـە پەژارەی جودایی خۆشەویستانمدا بوو، هەروەك خۆیشم لـە خـەمی ئـەوەدا بـووم کـە بـە تەنـها مابوومەوە. کتوپڕ لەم کاتەدا دوو وەرزەکەی پایز و زستانم بە دڵدا هات و بێئاگایی سـەری تێکردم، چونکە لەو دوو وەرزەدا گەڵاکان هەڵدەوەرن و جوانییان نامێنێت. لەمەوە خەم و خەفەتی زۆرم خوارد بۆ ئەو دار چنارە جوانانە و، هەموو زیندەوەران کـە ئێسـتا ئـەو زەوق و خـۆشـی و شادییەیان تێدا دەردەکەوێت پاشان لەو دوو وەرزەدا ئاوایان بەسەر دێت! بەڵێ، گـەلـێ خەفەت و ئازارم چەشت و، هێندە پـەژارەی ئـەوتـۆشـم لەسـەر کۆبوونـەوە (کـە لـە نـەمـان و جودایییەوە پەیدا بوون و ئەم پەردە ڕازێنراوە جوانەی بوونەوەریان پڕکردووە) کە بە جارێ هەردوو چاویان لە فرمێسك پڕکردم.

لەم کاتەدا کە من لەم بارە پەرێشـان و خـەم و پەژارەیـەدا بـووم، لـە پـڕ نـووری حەقیقـەتی محەممەدی ﷺ هـەروەك بـە هانـای هـەموو ئیمانداریێکـەوە دێـت، بە هانـای منیشـەوە هـات و، یەکسەر ئەو خەم و خەفەتە لـە سنوور بەدەرانـەی نەهێشـت و هـەموویانی گـۆڕی بـە چـەندین شـادمانی و دڵخۆشیی لەڕادەبەدەر، ئیتر وام لـێ هـات کـە بـە هەمیشـە و بـەردەوامی لـە ڕەزامەندی و سوپاسـگوزاریی ئـەو حەقیقـەتی محەممەدییـەدا بم، کە تەنـها یـەك بـەش لـە بەشـە زۆرەکـانی لێشـاوی نـوورە لـە سنوور و ڕادەبەدەرەکەی، منـی ڕزگـار کـرد و لـە هـەموو سووچێکی دەروون و ناخی ویژدانمدا دڵنەوایی بڵاوکردەوە. کە ئەمەش بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

ئـه‌و ڕوانینـه بـێ ئاگایانه‌یـه، گـه‌ڵا ناسـك و دره‌ختـه باڵابـه‌رزه‌کانیان بـێ ئـه‌رك و فـه‌رمانبـه‌ری و بێ سوود و بایه‌خ پیشاندام و، وای برده ئه‌ندێشـه‌مه‌وه که له‌رینه‌وه ناسك و جوانه‌کانیان هی توندی و زۆریـی شـه‌وق و زه‌وق و خۆشـی نی‌یـه، به‌ڵکو هـی بیـم و تـرس و له‌رزه له‌تاو سامناکیی نه‌مان و جودایی و له‌ناوچوون. به‌ڵێ، ئـه‌و ڕوانینـه بێ ئاگایانه‌یـه وای پیشاندام، ئه‌ولاتر بچێت.. بـه‌م پیشـاندانه‌ش ئه‌و عیشـقی مانه‌وه و خۆشه‌ویستی‌یه‌ی ژیـان و شـه‌یدای جوانـی و به‌زه‌یی‌هاتنه‌وه‌یه‌م بـه هاوڕه‌گـه‌زدا، که لـه من و هـه‌موو که‌سـێکی تـردا ڕه‌گیـان داکوتـاوه، هـه‌موو ئه‌مانـه‌می پێکـا و، بـه‌م جۆره دنیـای لـێ کـردم بـه دۆزه‌خێکـی مه‌عنه‌وی و، عه‌قڵیشی لـێ کردم به ئه‌ندامێك بۆ ده‌ردی سه‌ری و ئه‌شکه‌نجه و ئازار..

ئا له‌م کاته‌دا که من له‌م بارودۆخـه پڕ لـه ئـازاره‌دا بـووم، لـه پڕ ده‌بینـم ئه‌و نـووره‌ی کـه حـه‌زره‌تی محه‌مـه‌د ﷺ هـه‌موو مرۆڤایـه‌تیی پێ ڕوونـاك کـردوه‌وه، پـه‌رده لـه بـه‌رده‌م چـاومدا هه‌ڵده‌داتـه‌وه و چـه‌ندین دانسـت و واتـا و ئـه‌رك و فه‌رمانبـه‌ریی یـه‌کجار زۆر، کـه ده‌گه‌نـه ژماره‌ی گه‌ڵای چناره‌کان، ده‌رده‌خات و پیشانمیان ده‌دات. په‌یامه‌کانی نوور چه‌سپاندوویانه که ئه‌و فه‌رمانبه‌ری و ئه‌رکانه سێ به‌شن[1]:

*به‌شی یه‌که‌م:*

ئه‌و به‌شـه‌یه کـه ده‌ڕوانێتـه نـاوه جوانـه‌کانی به‌دیهێنـه‌ری مـه‌زن. جـا هـه‌روه‌ك ئه‌گـه‌ر وه‌ستایه‌کی کارامه و لێهاتوو مه‌کینه‌یه‌کی بێ‌وێنه دابهێنێت، ئه‌وا هه‌موان ستایشـی ده‌کـه‌ن و ڕێز له کاره‌که‌ی ده‌نێن و پیرۆزبایی داهێنانه‌که‌ی لـێ ده‌که‌ن، مه‌کینه‌که‌ش به هه‌مان جـۆر لـه ئاستی خۆی‌دا پیرۆزبایی له داهێنه‌ره‌که‌ی ده‌کات و به زمانی حاڵ ستایشـی ده‌کـات، بـه‌وه‌دا که ئه‌و به‌رهه‌مانه‌ی ئه‌وی له پێناودا دروست کراون و ئامانجی به‌دیهێنه‌ره‌که‌ین و ئێستا خـۆی به‌رهه‌می‌هێناون، به جۆرێکی ته‌واو پیشانی که‌سانی تر ده‌دات.

*به‌شی دووهه‌م:*

ئه‌وه‌یه کـه ڕوو ده‌کاتـه ڕوانیـن و بـه‌رچاوی زینـده‌وه‌ران و به‌دیـهێنراوه خـاوه‌ن هه‌سـت و شـعووره‌کان. واتـه: ده‌بێتـه مایـه‌ی موتـاڵا و سـه‌یرکردنێکی شیرین و سـه‌رنجدانێکی بـه‌تام بـۆ خاوه‌ن هه‌ستان. ئیتر هه‌موو شتێك وه‌کو کتێبێکـی زانسـتیی لـێ دێـت و ئـه‌م جیهانـه بینـراوه به‌جێ ناهێڵێت هه‌تا واتاکانی خۆی لـه زه‌ینـی خـاوه‌ن هه‌سـت و شـعووره‌کاندا و چـاپکردنی

---

(١) مامۆستا نوورسی لێره‌دا دوو فه‌رمانبه‌ریی باس کردووه. چونکه سێ‌هه‌میان هی شته‌که خۆیه‌تی. بڕوانه: (وتـه‌ی ده‌هه‌م، ڕاستیی شه‌شه‌م). (وه‌رگێڕ)

وێنەکانی لە مێشکیاندا و ڕەنگدانەوەی وێنەکەی و چاپبوونی لە لەوحی میسالیی تۆمارەکانی جیهانی پەنهانی غەیبدا، بەجێ نەهێڵێت. واتە: لە جیهانی بینراوەوە بۆ جیهانی پەنهان ناگەڕێتەوە تاکو نەچێتە ناو چەندین بازنەی "بوون"ی زۆرەوە و، چەندین جۆری "بوون"ی مەعنەوی و غەیبی و زانستی بەدەست نەهێنێت.

بەڵێ، مادەم خوا هەیە و زانیاریی ئەو هەموو شتێکی گرتووەتەوە، ئەوا لە ڕوانگەی حەقیقەتەوە نابێ بە هیچ جۆرێك لە جیهانی ئیمانداردا: (نەبوون و لەناودان و لەناوچوون و گاڵتەجاری و توانەوە و نەمان) ببێت. لە کاتێکدا کە دنیای کافران پڕە لە نەبوون و، جودایی و، گاڵتەجاڕی و، نەمان. ئەوەش کە ئەم ڕاستی‌یە ڕوون دەکاتەوە ئەو وتە بەناوبانگەیە کە بەسەر زمانی خەڵکی‌یەوەیە و هەردەم دەیڵێنەوە: (هەرکەسێك خوا بۆ ئەو بێت، هەموو شتێکی تریشی بۆ دەبێت.. ئەو کەسەش خوا بۆ ئەو نەبوو، هیچ شتێکی تری بۆ نی‌یە)!

**بە پوختی:**

"ئیمان" هەروەك لە کاتی سەرەمەرگدا مرۆڤ لە ئیعدامی هەمیشەیی ڕزگار دەکات، هەروەها دنیای هەموو کەسێکیش لە چەندین تاریکیی وەك: نەبوون و، لەناودان و، گاڵتەجاڕی و، بێ‌مەبەستی ڕزگار دەکات. بەڵام کوفر، بە تایبەتی ئەگەر کوفری موتڵەق بێت، ئەو مرۆڤە و دنیا تایبەتی‌یەکەشی بە مردنەکەی لەناو دەبات و دەیخاتە تاریکستانی دۆزەخێکی مەعنەوی‌یەوە و لەزەت و خۆشی‌یەکانیشی دەکات بە خەفەت و ئازار.

دەبا گوێی ئەوانەی فەزڵی ژیانی دنیا بەسەر ئاخیرەتدا دەدەن، بزرنگێتەوە و.. ئەگەر ڕاست دەکەن با چارەیەك بۆ ئەم کارە بدۆزنەوە، یان با بێنە ناو بازنەی ئیمانەوە و خۆیان لەم زیانە گەورەیە ڕزگار بکەن.

**﴿سبحانك لا علمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتنا إنّكَ أنتَ العليم الحكيم﴾.**

برای زۆر موشتاق و ئومێدەواری

دوعا و نزاتان:

**سەعیدی نوورسی**

# وتەی بیست و شەشەم

## پەیامی قەدەر

بسم الله الرّحـــمن الرّحيم

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلاَّ بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ﴾ (الحجر: ٢١)

﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ﴾ (يس: ١٢)

**(قەدەری خوای گەورە و جوزئـی ئیختیـاری دوو مەسـەلەی گرنگـن. هەوڵ دەدەین لە چوار "باس"دا، کـە تایبـەتن بـە قـەدەرەوە، هـەندێك لـە نهێنی‌یەکانیان شی بکەینەوە).**

# باسی یەکەم

"قەدەر" و "جوزئی ئیختیاری" باس و خواستی زانستی و نـەزەری نین، بـەڵکو دوو بەشـن لـە ئیمـانێکی "حـاڵی" و "ویژدانی"ی ئەوتۆدا کـە دوا سنووری ئیمـان و ئیسـلام دەستنیشـان دەکات.

واتە مرۆڤی ئیماندار هەموو شتێك دەداتە دەست خـوای گـەورە و هـەموو کاروبـارێك بـە هی ئەو دادەنێت، تەنانەت وای لـێ دێت کە خـودی خۆی و کارەکـانی خۆیشـی بۆ خـوای گەورە دەگێڕێتـەوە. بـەڵام بۆ ئـەوەی لـە ئەنجامدا لـە بەرپرسیاری و تـەکلیف دەربـاز نـەبێت "جوزئـی ئیختیـاری"ی لـە بـەردەمدا ڕاسـت دەبێتـەوە و پێـی دەڵێـت: (تـۆ موکەللـەفیت.. بەرپرسیاریت)!

پاشان بۆ ئـەوەی بـە کـردەوە چاکـەکانیش لـە خۆی بـایی نـەبێت، "قـەدەر" ڕووبـەڕووی دەبێتەوە و پێی دەڵێت: (سنووری خۆت بزانە.. تۆ بکەری ئەو کردەوانە نییت)!

بەڵێ، قەدەر و جوزئی ئیختیاری لـە بـەرزترینی پلـەکانی ئیمـان و ئیسـلامدان. بـۆ ئـەوەش خراونەتە نێوان بابەتە ئیمانی‌یەکانەوە چونکـە دەروونـی ئـادەمیزاد ڕزگـار دەکـەن، قـەدەر لـە

"غروور" ڕزگاری دەکات و، جوزئی ئیختیاریش لەوەی کە هەست بە "بەرپرسیاری" نەکات. واتە هەرگیز ئەم دوانە لە باس و بابەتە زانستی و نەزەرییەکان نین تا لە ئەنجامدا بە تەواوی دژ و پێچەوانەی نهێنیی قەدەر و حیکمەتی جوزئی ئیختیاری دەربچن و، دەست لە داوێنی "قەدەر" گیر بکرێت بۆ خۆ قورتارکردن لە بەرپرسیاریی ئەو کردەوە خراپانەی کە دەروونە خراپکارەکان ئەنجامیان داون و، پاشان ئەو کردەوە چاکانەش کە وەك نیعمەت پێی بەخشراون شانازییان پێوە بکرێت و بە هی "جوزئی ئیختیاری" دابنرێن!

بەڵێ، ئەو عەوامانەی کە نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستەی پەی بەم نهێنییەی قەدەر ببەن، دەچن لە چەند جێگایەکی دیاریکراودا بەکاری دەهێنن. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو جێگایانەی کە قەدەریان بۆ بەکار دێت تەنها بریتین لە: کاروبارە ڕابوردووەکان و بەڵا و موسیبەتەکان. چونکە لەو بوارانەدا "قەدەر" دەبێت بە چارەسەریی خەم و نائومێدی. بەڵام هەرگیز ڕەوا نییە کە قەدەر لە بوارەکانی گوناهـ و تاوان و ڕووداوەکانی ڕۆژگارانی داهاتوودا بەکار بهێنرێت و، قەدەر لەو بوارانەدا هەرگیز یارمەتیدەری گوناهکاری و سستی کردنی مرۆڤ نییە لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی ئەستۆیدا.

بەو واتایەی کە "مەسەلەی قەدەر" بۆ ڕاکردن نییە لە دەست تەکلیف و بەرپرسیاری، بەڵکو بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤە لە "بەخۆنازین" و "لەخۆبایی بوون". هەر لەبەر ئەوەش خراوەتە نێوان مەسەلەکانی ئیمانەوە..

بەڵام "جوزئی ئیختیاری" بۆ ئەوە ڕۆشتووەتە ناو باسەکانی عەقیدەوە تاکو ببێت بە مەرجەعی گشت خراپکارییەکان، نەك سەرچاوەیەك بێت بۆ کردەوە چاکەکان. واتە بۆ ئەوەی ئەو کردەوە چاکانە مرۆڤ بەرەو سەرکەشی و فیرعەونایەتی نەدەنەبەر.

بەڵێ، قورئانی پیرۆز دەری دەخات کە: مرۆڤ بە تەواوەتی بەرپرسیاری کردەوە خراپەکانیەتی، چونکە مرۆڤ خۆی ئەو کردەوە خراپانەی "ویستووە". جا لەبەر ئەوەی کردەوە خراپەکان لە بابەتی "ڕووخاندن"ن ئەوا مرۆڤ دەتوانێت تەنها بە یەك کردەوەی خراپ ڕووخاندنێکی گەورە ئەنجام بدات، وەك ئەوەی بە یەك دەنکە شقارتە ماڵێکی تەواو بسووتێنێت. هەر لەبەر ئەوەیە کە شایستەی تۆڵەیەکی یەکجار گەورە دەبێت.

بەڵام لە کردەوە چاکەکاندا، مرۆڤ مافی شانازی و بەخۆنازینی نییە، لەبەر ئەوەی بەشی ئەو لە کردەوە چاکەکاندا یەکجار کەمە، چونکە تەنها "میهرەبانی"ی خوای گەورە "داخوازی" ئەو کردەوە چاکانە بووە و ویستوویەتی ئەنجام بدرێن و.. "توانست"ی پەروەردگاریش ئەو کردەوانەی بەدی هێناوە. کەواتە پرسیار و وەڵام و هۆکار و داخواز بۆ کردەوە چاکەکان هەموویان لە لایەن خوای گەورەوەن، مرۆڤیش تەنها بە نزا و لاڵانەوە و

ئیمان و هەستی ڕازی بوون لەو كردەوە چاكانە، دەبێت بە خاوەنیان. كەچی كردەوە خراپەكان وا نین، ئەوەتا دەروونی مرۆڤ خۆی - چ بە ئامادەبوون و لێهاتن و چ بە ئیختیار - ویستوویەتی ببن. بە وێنەی ئەو ماددانەی كە لە ڕێی بەركەوتنی تیشكی ڕووناكیی جوان و درەخشانی خۆرەوە بۆگەنی بەدەست دەهێنن و ڕەش دەبنەوە، چونكە ئەو ڕەشییە هی توانا و لێهاتنی خودی ماددەكانە! بەڵام دەبێ بزانین كە ئەو كەسەی بەپێی یاسایەكی خوایی پڕ لە بەرژەوەندیی زۆر و زەبەندە ئەو خراپكارییانە بەدی دەهێنێت، هەر تەنها خوای گەورەیە. واتە هۆكار و داخوازی ئەو خراپكارییانە لە ناخی "دەروون"ی مرۆڤەوەن، بۆیە بەرپرسیاریی ئەو كردەوانەی لە ئەستۆدایە. بەڵام "دروستكردن" و "بەدیهێنانیان" كە تایبەتە بە خوای گەورەوە، كارێكی جوانە، چونكە ئەم بەدیهێنانە گەلێ بەروبووم و ئەنجامی تری جوانی هەیە، كەواتە بەدیهێنانیان كارێكی خێرە.

لەم نهێنییەوە دەردەكەوێت كە: بەدیهێنان(خلق)ی شەڕ، شەڕ نییە.. بەڵام بەدەستهێنان(كسب)ی شەڕ بە شەڕ دادەنرێت، چونكە ئەو مرۆڤە تەمبەڵەی زیانی لە بارانەوە پێ گەیشتووە - ئەو بارانەی كە گەلێ بەرژەوەندیی تێدایە - مافی ئەوەی نییە بڵێت: باران میهرەبانی نییە.

بەڵێ، دروستكردن و بەدیهێنانی شەڕ، وێڕای ئەو شەڕە جوزئییەی كە تیایدایە، گەلێ خێری زۆر و زەبەندەشی لەخۆ گرتووە. خۆ ئەگەر لەبەر پەیدانەبوونی ئەو شەڕە جوزئییە دەست لەو بەدیهێنانە هەڵبگیرایە و ئەو هەموو خێرە زۆرانە وازیان لێ بهێنرایە، ئەوا شەڕێكی گەلێ زۆر و زەبەندە ڕووی دەدا! لەبەر ئەوە ئەو "شەڕ"ە جوزئییەش هەر بە"خێر" دادەنرێت، یان لە حوكمی "خێر"دا دەبێت! دەبێ بیشزانین كە هەرگیز هیچ شەڕ و ناشیرینییەك لە بەدیهێنانەكەی خوای گەورەدا نییە، بەڵكو گەر هەر شەڕێك ببێت دەگەڕێتەوە بۆ بەدەستهێنان و توانا و لێهاتنی بەندەكانی.

ئنجا هەروەك لە ڕووی ئەنجام و بەروبوومەكانەوە قەدەری خوای گەورە دوور و خاوێنە لە ستەم و ناشیرینی، لە ڕووی عیللەت و هۆكاریشەوە هەر خاوێنە لێیان. چونكە قەدەری خوای گەورە ڕووی لە هۆكار و عیللەتە ڕاستەقینەكانە، بۆیە بە عەدالەت ڕەفتار دەكات. بەڵام خەڵكی حوكم و بڕیارەكانیان لەسەر ئەو هۆكارە ڕواڵەتییانە بنیات دەنێن كە بە چاو دەیانبینن، بۆیە لە ناوەندی عەدالەتی خودی قەدەردا ئەوان لە بڕیارەكانیاندا ستەم دەكەن!

بۆ نموونە: وا دابنێ حاكمێك بە تۆمەتی دزییەك كە تۆ نەتكردووە، بڕیاری زیندانیت لەسەر دەربكات، بەڵام هەر لەو كاتەدا كێشەی "قەتڵ"ێكی پەنهانیشت لە ئەستۆدا بێت كە جگە لە خوای گەورە كەسیتر پێی نەزانێت..

لەم حاڵەتەدا قەدەری خوای گەورە بڕیاری بەندیی لەسەر دەرکردوویت، بڕیارەکەشی عادڵانەیە، لەبەر ئەو قەتڵەی کە خەڵکی پێی نازانن.. کەچی حاکم ستەمی لێ کردوویت، چونکە بڕیاری زیندانیی لەسەر تۆمەتی دزییەك بۆ دەرکردوویت کە تۆ لێی بەری و بێ ئاگایت.

بەم جۆرە دەرکەوت کە: لە تەنها یەك شتدا دوو ڕوو دەردەکەون: ڕووی دادگەری و بەدیهێنانی خوای گەورە.. هەروەها ڕووی ستەم و بەدەستهێنانی مرۆڤ. بۆ خۆت شتانی تر بەپێی ئەم نموونەیە لێك بدەرەوە.

واتە لە ڕووی سەرەتا و ئاکام و ئەسڵ و فەرع و هۆکار و ئەنجامەکانەوە، قەدەر و بەدیهێنانی خوای گەورە دوور و خاوێنن لە: شەڕ و ناشیرینی و ستەم.

**ئەگەر بوترێت:**

مادەم "جوزئی ئیختیاری" توانای بەدیهێنانی نییە و، جگە لەو بەدەستهێنانەی کە لە حوکمی شتێکی گوێڕەیی(إعتباری)دایە هیچی تر لە دەستی مرۆڤدا نییە، ئیتر بۆچی قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجازی بەیان لە بەرامبەر سەرپێچی و ملنەدانی مرۆڤ بۆ فەرمانەکانی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، سکاڵای گەورە گەورە لە دەست ئەم مرۆڤە دەکات، تەنانەت مرۆڤی لە دۆخی دوژمنێکی ملنەدەری لاسار و سەرسەختدا دەرخستووە، بگرە بۆ یارمەتیدانی بەندەیەکی ئیماندار لە بەرامبەر ئەو مرۆڤە ملنەدەرەوە، خوای گەورە سوپای مەلائیکەت دەنێرێت، تەنانەت خواوەندی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆ خۆیشی پشتی دەگرێت و یارمەتیی دەدات؟! ئایا ئەم گرنگییە لەڕادەبەدەرە بەم مرۆڤە ملنەدەرە لە پێی چی؟

**وەڵام:**

چونکە "کافری" و "گوێڕایەڵی نەکردن" و "خراپکاری" - هەر هەموویان - بریتین لە ڕووخاندن و نەبوون و، لەبەر ئەوەش کە دەگونجێت گەلێ کاولکاریی زەبەندە و مەزن و نەبوون(عدم)ی بێسنوور لە تەنها یەك کاری گوێڕەیی و عەدەمییەوە پەیدا ببن..

ئەوەتا هەروەك ئەگەر کەشتیوانی کەشتییەکی زەبەلاح ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ نەکات، کەشتییەکە نوقم دەبێت و ئەنجامی کرد و کۆششی هەموو کارگوزارانی ئەو کەشتییە بە فیڕۆ دەدات و لە پشت گوێ خستن و ئەنجامنەدانی تەنها یەك کارەوە ئەو هەموو کاولکارییە گەورانە پەیدا دەبن.. "کافری" و "سەرپێچی"ش بەرامبەر خوای گەورە بە هەمان جۆرن، چونکە جۆرێکن لە "نەبوون" و "کاولکاری". ئەوەتا "جوزئی ئیختیاری" دەتوانێت لە ڕێی کارێکی ئیعتبارییەوە بیانبزوێنێت و بیانکات بەهۆی سەرهەڵدانی گەلێ

ئه‌نجامی سامناك! چونكه هه‌رچه‌نده "كوفر" له خۆیدا ته‌نها یه‌ك تاوانه، كه‌چی له ناوه‌رۆكدا بریتی‌یه له: سووكایه‌تی كردن به هه‌موو بوونه‌وه‌ران له‌و ڕووه‌وه كه بێ‌نرخی و بێ‌مه‌به‌ستی‌یان ده‌داته پاڵ و.. بریتی‌یه له به‌درۆخستنه‌وه‌ی سه‌رجه‌م ئه‌و بوونه‌وه‌رانه‌ی كه به‌ڵگه‌ی "یه‌كتایی"ی خوای گه‌وره‌ن و.. شێواندن و ئاڵۆزاندنی سه‌رجه‌م دره‌وشانه‌وه‌كانی ناوه جوانه‌كانی خواوه‌ندیشه..

له‌به‌ر ئه‌وه، هه‌ڕه‌شه‌ی توندوتیژ و سامناكی خوای گه‌وره، به ناوی سه‌رجه‌می بوونه‌وه‌ران و گشت ناوه جوانه‌كانیه‌وه، له مرۆڤی كافر، عه‌ینی حیكمه‌ته و.. ئازاردانیشی به سزایه‌كی هه‌میشه‌یی، عه‌ینی دادگه‌ری‌یه!

ئنجا له‌و ڕووه‌وه كه مرۆڤ، به كافری و سه‌رپێچی كردن، لایه‌نی كاولكاری ده‌گرێت و، ئه‌نجامدانی كارێكی جوزئیش ده‌بێت به‌هۆی ئه‌نجامدانی كاولكاری‌یه‌كی گه‌لێ سامناك، ئه‌وا ئه‌هلی ئیمان به‌رامبه‌ر به‌و كاولكارانه پێویستیان به چاودێری‌یه‌كی مه‌زنی خوایی ده‌بێت، چونكه ئه‌گه‌ر پارێزگاری و ئاوه‌دانكردنه‌وه‌ی خانوویه‌ك به ده پیاوی به‌هێز بسپێررێت، هه‌ر ته‌نها هه‌وڵدانی سووتاندنی ئه‌و خانووه له لایه‌ن منالێكی خراپكاره‌وه ئه‌و ده پیاوه به‌هێزه ناچار ده‌كات ده‌سته‌ودامێنی خاوه‌نی ئه‌و مناڵه بین و ته‌نانه‌ت هانا بۆ لای پادشایش به‌رن..

له‌به‌ر ئه‌وه، ئیمانداران گه‌لێ پێویستیان به چاودێریی خوای گه‌وره هه‌یه، تاكو بتوانن له به‌رامبه‌ر ئه‌و خراپكارانه‌وه خۆیان ڕابگرن.

**له‌مانه‌ی پێشه‌وه ده‌گه‌ینه ئه‌و ئه‌نجامه‌ی كه:**

ئه‌و كه‌سه‌ی له "قه‌ده‌ر" و "جوزئی ئیختیاری" ده‌دوێت ئه‌گه‌ر خاوه‌نی ئیمانێكی كامڵ و دڵێكی دامه‌زراو بێت، ئه‌وا كاروباری سه‌رجه‌م بوونه‌وه‌ران ته‌نانه‌ت خۆیشی بۆ خوای گه‌وره ده‌گێڕێته‌وه و، له‌و باوه‌ڕه‌دا ده‌بێت كه هه‌موو كاروبارێك له ژێر ده‌سته‌ڵاتی خواوه‌ندایه و به‌كارسازیی خوای گه‌وره ئه‌نجام ده‌درێت. ئه‌و جۆره كه‌سه مافی ئه‌وه‌ی هه‌یه كه قسه له قه‌ده‌ر و جوزئی ئیختیاری بكات، چونكه ده‌زانێت چ خۆی و چ هه‌موو شتێكی تر له خوای گه‌وره‌وه‌یه و، "به‌رپرسیاری" ده‌خاته ئه‌ستۆی جوزئی ئیختیاریی خۆیه‌وه كه به سه‌رچاوه‌ی هه‌موو خراپكاری‌یه‌كانی داده‌نێت. ئیتر به‌م پێیه په‌روه‌ردگاری خۆی له بیروباوه‌ڕی‌دا به خاوێنی ڕاده‌گرێت و، له بازنه‌ی "به‌ندایه‌تی"دا ده‌مێنێته‌وه و، مل بۆ داخوازی و ته‌كلیفه‌كانی خوای گه‌وره كه‌چ ده‌كات و ده‌یانخاته ئه‌ستۆی خۆیه‌وه و، له كرده‌وه چاكه‌كانیشی‌دا بۆ "قه‌ده‌ر" ده‌ڕوانێت تاكو گرفتاری له‌خۆبایی‌بوون نه‌بێت. ئیتر له

بریی فەخر و شانازی، شوکرانەبژێری پەروەردگاری دەبێت و، لەو بەڵا و موسیبەتانەشدا کە دێنە رێی، سەیری "قەدەر" دەکات و ئارام دەگرێت.

بەڵام گەر ئەو کەسەی کە لە قەدەری ئیلاهی و جوزئی ئیختیاری دەدوێت، لە بێئاگایان بێت، ئەوا مافی لێدوان و دەم وەردانی لەو باسانەدا نی‌یە! چونکە بە هاندانی بێئاگایی و گومڕاییەوە "دەروونی بەدخواز"ی ئەو کەسە، سەرجەمی بوونەوەران - کە هی خوای گەورەن - بۆ هۆکارەکان دەگێڕێتەوە و، خۆی بە خاوەنی خۆی دەبینێت و، کردارەکانی دەداتە پاڵ خۆی و هۆکارەکان. کەچی کەمتەرخەمی و بەرپرسیاری‌یەکان دەخاتە ئەستۆی قەدەرەوە! دیارە ئەو کاتەش باسکردنی قەدەر و جوزئی ئیختیاری - بەم بۆچوونە - بە کارێکی ناڕەوا دادەنرێت و، فێڵێکی دەروونی‌یە بۆ خۆ دەربازکردن لە "بەرپرسیاری". کە ئەمەش پێچەوانەی حیکمەتی قەدەر و نهێنیی جوزئی ئیختیاری‌یە!

# باسی دووهەم

ئەم باسە توێژینەوەیەکی وردی زانستی‌یە و تایبەتە بە زانایانەوە[1]

**ئەگەر دەڵێیت:** قەدەر و جوزئی ئیختیاری چۆن پێکدێن و بە یەکەوە دەسازێن؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:** بە حەوت ڕوو:

*ڕووی یەکەم:* ئەو خواوەندە دادگەر و دانایەی کە سەرجەمی بوونەوەران، بە زمانی ڕێکوپێکی و هاوسەنگی‌یان، شایەتی لەسەر دادگەری و دانایی‌یەکەی دەدەن، ئەو خواوەندە، جوزئێکی ئیختیاریی ماهییەت نەزانراوی بە مرۆڤ بەخشیوە، تاکو ببێت بە خولگەی تۆڵە و پاداشتەکان. جا هەروەك خواوەندی دادگەری دانا گەلێ حیکمەتی هەیە کە لە ئێمە پەنهانن، بە هەمان جۆر، چۆنێتیی تەوفیق خستنیش لە نێوان قەدەر و جوزئی ئیختیاری‌دا پەنهان و شارراوەیە لێمان، بەڵام پەی نەبردنی زانیاریی ئێمە بە چۆنێتیی ئەو تەوفیق‌خستنە ئەوە ناگەیەنێت کە لە ڕاستی‌دا نی‌یە.

*دووهەم:* بێ هیچ گومانێك هەموو مرۆڤێك لە خۆی‌دا هەست دەکات کە هەست و ئیختیارێکی هەیە و، بە هەستی ناخ(وجدان)ی خۆی بوونی ئەو ئیختیارە دەزانێت. ئنجا زانینی ماهییەتی بوونەوەران جیاوازە لە زانین و پەی بردن بە "بوون"یان، ئەوەتا بوونی زۆر

---

(١) ئەم باسی دووهەمە قووڵترین و سەخت‌ترین مەسەلەی قەدەرە و، بابەتێکی عەقیدەیی زانستی کەلامە و، لای زانا لێکۆڵەرەکان بایەخێکی گەورەی هەیە و، پەیامەکانی نوور بە تەواوەتی شی‌یان کردووەتەوە. (دانەر)

شت بەدیهی و بەڵگەنەویستە لـە لامـان، کـەچی سـەبارەت بـە ئێمـەوە ماهییەتەکـەی تـا ئێستـ نەزانراوە چی‌یە. جـا ئـەم جوزئـە ئیختیاری‌یـەش دەگونجێـت یـەکێك بێـت لـەو زنجیرەیـە. خـۆ هـەموو شتێك لـە چوارچێوەی زانیـاریی ئێمـەدا نی‌یـە و، ئاگـادار نـەبوونمان لـە هـەر شـتێك بەڵگەی نەبوونی ئەو شتە نی‌یە.

*سێ‌هەم*: "جوزئی ئیختیـاری" پێچەوانـەی "قـەدەر" نی‌یـە، بەڵکـو قـەدەر پشـتی جوزئـی ئیختیاری دەگرێت، چونکە قەدەر جۆرێکـە لـە زانستی خـوای گـەورە، خـۆ زانستی خـوای گەورەش پەیوەندیی بە ئیختیاری ئێمەوە بەستووە. لەبەر ئەوە، قەدەر پشتی ئیختیار دەگرێت و بەتاڵی ناکاتەوە.

*چوارەم*: قەدەر جۆرێکە لە زانست. خۆ "زانست"یش شـوێنکەوتەی "زانـراو"ە[1]. واتـە: زانراوەکە لەسـەر هـەر چۆنێتی‌یـەك بێـت، زانسـت بـە تـەواوەتی دەیگرێتـەوە و ئاگـای لێـی دەبێت و پەیوەندیی پێوە دەبەستێت و، هـەرگیز بـە پێچەوانـەوە نی‌یـە تـا زانـراو شـوێنکەوتەی زانست بێت. واتە یاسا و دەستوورەکانی زانست بناغەیەك نـین بـۆ ئـەوەی (لـە ڕووی بوونـی دەرەکی‌یەوە) زانراوەکە هەڵبسوورێنن، چونکـە زات و بوونـی دەرەکیـی خـودی زانراوەکـە چاوی لـە ویست(إرادة)ە و پاڵی بە توانست(القدرة)ەوە داوە.

ئنجا "ئەزەل"یش بریتی نی‌یە لە کۆتایی زنجیرەی ڕابوردوو، تـاکو بکرێـت بـە بناغەیـەك بـۆ بوونـی شتان و، بـە ناچـاری شتان بـەو پێ‌یـە تەسـەوور بکرێـن. نـەخێر.. بـەڵکو ئـەزەل وەك دەورەدانی ئاسمان وایـە بـە زەوی‌دا و، بـە وێنـەی دەرکـەوتنی شتان لـەناو ئاوێنەیـەکدا کـە لـە بەرزایی‌یـەوە دابنرێت ئـەزەلیش دەورەی ڕابـوردوو و ئێسـتا و ئـایندەی داوە. لەبـەر ئـەوە، هـەرگیز کـارێکی ڕاسـت و ڕەوا نی‌یـە کـە مـرۆڤ - بـە خـەیاڵ - سـەرەتایەك لـە لایـەنی ڕابوردوودا بۆ ئەو زەمانە درێژخایەنە دابنێت کە لـە بازنـەی "مومکینـات"دایـە و پاشـان بچـێ ناوی "ئەزەل"ی لـێ بنێت و، ئنجا شتانیش بە نۆرە و یەك لە دوای یەك بڕۆنـە نـاو ئـەو زانستە ئەزەلی‌یە و، مرۆڤ - بە وەهمی خۆی - خۆیشی لە دەرەوەی ئەو زانستە ئەزەلی‌یـە دابنێت و، پاشان لەسەر ئەم بناغەیە داوەری‌یەکی ژیری (موحاکەمەیەکی عەقڵی) ساز بکات!

سەیری ئەم نموونەیە بکە، با ئەم نهێنی‌یەت بۆ ئاشکرا ببێت:

ئەگەر ئاوێنەیەکت لە دەستدا بێت و وات دانا کە ئەو ماوە(مســـافة)یـەی دەکەوێتـە لای ڕاستی ئاوێنەکە ڕابوردوو بێت و ماوەکەی لای چەپیشی داهاتوو بێت. جا ئەو ئاوێنەیە تەنـها ئـەو شتانەی تێـدا دەردەکـەون کـە لـە بەرامبەریـەوەن و بـە یـەك تـەرتیبی یـەك لـە دوای یـەکی

(١) "العلمُ تابعٌ للمعلوم" دەستوورێکی بەناوبانگە. (وەرگێڕ)

دیاری کراو هەردوو لاکەی تێدا دەردەکەون و، زۆربەی ئەو دوو لایەی پێکەوە تێدا جێ نابێتەوە، چونکە تا ئاوێنەکە نزمتر بێت ماوەی کەمتری تێدا دەردەکەوێت، بەڵام ئەگەر ئاوێنەکە تا دەتوانرێ بەرز بکرێتەوە ئەوا بازنەکەی بەرامبەریشی تێدا فراوان دەبێت، بەم جۆرە هەتا وردە وردە ئاوێنەکە سەربخرێت ئەوا لە یەك کاتدا هەردوو ماوەکەی تێدا دەردەکەون و، ئاوێنەکە لەم دۆخەی‌دا هەموو ئەو حاڵەتانەی تێدا دەبینرێن کە لە هەردوو ماوەکەدا ڕوو دەدەن. ئیتر لەم کاتەدا ناوترێت کە: ئەو حاڵەتانەی لە یەکێکی ئەو دوو لایەدا ڕوو دەدەن پێش ئەوی تریانە، یان دوای ئەوی تریانە، یان وەکو یەك وان.

قەدەری خوای گەورەش بە هەمان جۆرە، چونکە لەبەر ئەوەی بەشێکە لە "زانستی ئەزەلی" و، زانستی ئەزەلیش وەك فەرموودەی پیرۆز دەری خستووە: (لە پلەیەکی هێندە بڵنددایە کە سەرجەمی ئەو شتانەی بوون و ئەوانەش کە لەمەولا دەبن، دەگرێتەوە) ئەوا نە ئێمە و نە داوەری‌یە ژیری‌یەکانمان، لەم زانستە بەدەر نیین تاکو خۆمان لە دەرەوەی ئەم زانستە دابنێین و تەنها بە ئاوێنەیەك تەسەووری بکەین کە کەوتبێتە ماوەی ڕابوردووەوە!!

پێنجەم: قەدەری خوای گەورە بە تەنها یەك تەعەللوق و پێکەوە پەیوەندی دەکات بە هەریەك لە "هۆکار" و "بەهۆکراو". واتە ویستی خوای گەورە جارێك پەیوەندی ناکات بە "موسەببەب" واتە بەهۆکراوەکەوە و جارێکی تریش بە هۆکارەکەوە.

بە واتایەکی تر: ئەو "بەهۆکراو"ە بەو "هۆکارە" ڕوو دەدات. لەبەر ئەوە، نابێ بوترێت: مادەم مردنی فلان کەس لە فلان کاتدا دەستنیشان(تقدیر) کراوە، ئیتر ئەو مرۆڤە تاوانی چی‌یە کە لە ڕێی ویستە جوزئی‌یەکەیەوە بە تفەنگ تەقەی لێ دەکات؟ خۆ ئەگەر تەقەشی لێ نەکردایە هەر دەمرد!

**پرسیار**: بۆچی دەبێ ئەمە نەوترێت؟

**وەڵام**: چونکە "قەدەر" مردنی ئەوی بەو تفەنگە دەستنیشان کردووە، کەواتە ئەگەر وا دابنێیت ئەو تەقەی لێ نەکات ئەوا لەو کاتەدا ئەوەش دادەنێیت کە قەدەر پەیوەندیی بە مردنیەوە نەدەکرد، ئیتر بەچی بڕیار دەدەیت کە هەر دەمرد؟! مەگەر ڕێبازی سوننەت و جەماعەت واز لێ بهێنیت و بڕۆیتە ناو ئەو تاقمە گومڕایانەی کە تەسەووری قەدەرێکی جیایان بۆ "هۆکار"ەکە و قەدەرێکی تریان بۆ "بەهۆکراو"ەکە کردووە، وەك جەبری‌یەکان.. یان "ئینکاریی قەدەر" بکەیت بە وێنەی موعتەزیلەکان. بەڵام ئێمەی ئەهلی حەق دەڵێین: ئەگەر تەقەی لێ نەکردایە مردنەکەی لای ئێمە نەزانراوە. جەبری‌یەکان دەڵێن: تەقەشی لێ نەکردایە هەر دەمرد. کەچی موعتەزیلەکان دەڵێن: گەر تەقەی لێ نەکات نامرێت.

*شەشەم*[(١)] : "مەیەلان" کە بناغەی سەرەکیی جوزئی ئیختیاری‌یە، بەلای ڕێڕەوی "ماتوریدی"یەوە شتێکی گوێرەیی(اعتباری)یە و دەکرێ بە دەستی مرۆڤ بێت، کەچی بەلای ڕێڕەوی "ئەشعەری"یەوە شتێکی مەوجوودە ر بەدەست مرۆڤ نی‌یە. بەڵام پێیان وایە کە هەڵسوکەوت کردن لەم مەیەلانەدا شتێکی ئیعتباری‌یە و بە دەستی مرۆڤە. لەبەر ئەوە، چ ئەو مەیەلانە و چ هەڵسوکەوت کردن تیای‌دا، دوو شتی گوێرەیین و بوونی دەرەکیی ڕاستەقینەیان نی‌یە. خۆ بوونی شتی گوێرەییش پێویستی بە هۆکارێکی تەواوەتیی ئەوتۆ نی‌یە کە بە زەروورەت داخوازی هەڵگرتن و نەهێشتنی ئیختیار بێت، بەڵکو ئەگەر هۆکاری ئەو شتە گوێرەیی‌یە کەوتە دۆخی پلەی "ڕوجحان"ەوە، ئەوا دەگونجێ بمێنێتەوە و دەشگونجێ هەر لەو دەمەدا مرۆڤ وازی لێ بهێنێت، تا لەو ساتەدا قورئان بە مرۆڤ دەڵێت: ئەمە کردەوەی خراپە، مەیکە!

بەڵێ، ئەگەر مرۆڤ بەدیهێنەری کردارەکانی بوایە و توانای بەدیهێنانی ببوایە ئەوا ئیختیار لە گۆڕێ‌دا نەدەما و هەڵدەگیرا، چونکە دەستووری بڕیاردراوی زانستی ئوسووڵ و حیکمەت لەم بوارەدا ئەوەیە کە: "ما لم يجب لم يوجد" واتە گەر هەر شتێك بوونی پێویست نەبێت نایەتە "وجوود". بەو واتایەی دەبێ ئەو شتە "هۆکاری تەواوەتی"ی هەبێت ئنجا دێتە وجوود. خۆ "هۆکاری تەواوەتی"ش بە "زەروورەت" و "وجوب" داخوازی بەهۆکراو(معلول)ەکە دەبێت. ئەو کاتەش "ئیختیار" لە گۆڕێ‌دا نامێنێت!

**ئەگەر دەڵێیت:** (تەرجیحدانی بێ تەرجیحدەر کارێکی مەحاڵە، کەچی بەدەستهێنان(الكسب)ی مرۆڤ، کە تاوێ بە ئەنجامدانی کار و تاوێکی تر بە ئەنجامنەدانی، ناوی شتی ئیعتیباریتان لێ ناوە، داخوازی ئەوە دەبێت کە لە کاتی نەبوونی تەرجیحدەری موجیبدا تەرجیحی بێ‌تەرجیحدەر بدرێت، ئەمەش گرنگترین بناغەکانی زانستی کەلام هەڵدەوەشێنێتەوە)؟!

**وەڵام:** خۆ تەرجیحدان(الترجح)ی بێ تەرجیحدەر (واتە بێ هۆکارێکی تەرجیحدەر) مەحاڵە، نەك تەرجیحدان(الترجيح)ی بێ‌تەرجیحدەر، کە دروستە و لە واقیعدا هەیە. چونکە ویستی خوای گەورە - کە یەکێکە لە سیفەتەکانی - ئەم کارە دەگرێتە ئەستۆ (واتە ئیختیاری خوای گەورە دەبێت بە تەرجیحدەر).

**ئەگەر دەڵێیت:** مادەم ئەو کەسەی قەتڵەکەی بەدی هێناوە خوای گەورەیە، ئیتر بۆچی بە من دەوترێت: قاتڵ؟

(١) ڕاستی‌یەکە تایبەتە بە زانایانی تەواو وردەکارەوە. (دانەر)

**وەڵام:** بەپێی دەستووری عیلمی صەرف: "ئیسمی فاعل"[١] لە "مەصدەر" وەردەگیرێت کە شتێکی گوێرەیی‌یە و، هەرگیز لە ئەنجامی مەصدەرەکە وەرناگیرێت کە کارێکی سابت و دیاری کراوە. جا مەصدەرەکە لەم کێشەیەدا دەستکەوتەکەی ئێمەیە و ئێمە ناونیشانی قاتڵمان لە ئەستۆدایە، بەڵام ئەنجامی مەصدەرەکە بەدیهاتووی خوای گەورەیە.

جا هەر شتێك بۆنـی "بەرپرسیاری"ی لێ بێت هەرگیز لە ئەنجامی مەصدەرەکە وەرناگیرێت و لەو ئیشتیقاق ناکرێت.

حەوتەم: "ویستی جوزئی" یان "جوزئی ئیختیاری"ی مرۆڤ لاوازە و شتێکی ئیعتیباری‌یە، کەچی خوای گەورە کە خاوەنی دانستی ڕەهایە، ئەو ویستە جوزئی‌یە لاوازەی کردووە بە مەرجێکی ئاسایی بۆ ویستە کوللی‌یەکەی خۆی. واتە وەك بڵێی خوای گەورە لە واتا و ناوەڕۆکدا دەفەرموێت: "ئەی بەندەکەی خۆم! تۆ هەر ڕێگایەك هەڵبژێریت من بۆ ئەو ڕێگایە دەتدەمە بەر. لەبەر ئەوە، "بەرپرسیاری" تەنها لە ئەستۆی خۆتدایە".

بۆ نموونە: ئەگەر منداڵێکی دەستەوسانی لاوازت لەسەر شانت هەڵگرت و سەربەستیت دایە دەست خۆی و پێت وت: چ جێگایەکت دەوێت دەتبەم بۆ ئەوێ، منداڵەکەش داوای کرد بۆ سەر چیایەکی مەزن سەری بخەیت و تۆش بردت بۆ ئەوێ. بەڵام منداڵەکە لەوێ نەخۆش کەوت یان کەوتە خوارەوە، بێ گومان پێی دەڵێیت: تۆ خۆت داوای ئەمەت کرد. ئیتر سەرزەنشتی دەکەیت و، جگە لە ئازارەکەی خۆی، ئازاری زللەی تەمێدانیشی بۆ زیاد دەکەیت! خوای گەورەش - ولله المثل الأعلى - بە هەمان جۆرە، ئەوەتا ئەو خواوەندەی کە "أحكم الحاكمين"ە، "ویست"ی ئەم بەندەیەی خۆی، کە لەوپەڕی لاوازی‌دایە، کردووە بە مەرجێکی ئاسایی بۆ ویستە هەمەکی‌یەکەی خۆی.

**پوختەی ئەم قسانە:**

ئەی ئادەمیزاد! تۆ خاوەنی "ویست"ێکیت کە هەرچەندە لەوپەڕی لاوازی‌دایە، کەچی لە خراپکاری و کاولکاری‌دا دەستی درێژە و لە چاکەکاری‌دا دەستی کورتە. ئەم ویستەش ئەوەیە کە ناوی "جوزئی ئیختیاری"ی لێ نراوە.

جا تۆش - ئەی مرۆڤ! - "دوعا و پاڕانەوە" لەناو یەکێك لە دەستەکانی ئەو ویستەتدا دابنێ، تاکو درێژ ببێت و بگات بەو بەهەشتەی کە یەکێکە لە بەروبوومەکانی زنجیرەی چاکەکاری‌یەکان و، بۆ ئەوەی بگەیت بە بەختەوەریی هەمیشەیی کە یەکێکە لە گوڵەکانی گوڵزاری بەهەشت.. دەستەکەی تری ئەو ویستەشت "داوای لێخۆشبوون"(الاستغفار)ی

(١) واتە: وەك "قاتڵ". (وەرگێڕ)

تێدا دابنێ، تاكو هێنده كورت ببێته‌وه كه نه‌گاته خراپكاری‌یه‌كان و به‌ری ئه‌و دره‌خته نه‌فره‌ت لێكراوه كه دره‌ختی زه‌ققومی دۆزه‌خه! واته "پاڕانه‌وه و ته‌وه‌ككول" هێزێكی گه‌وره به مه‌یلی خێر ده‌به‌خشن و، "تۆبه و ئیستیغفار"یش مه‌یلی خراپكاری ده‌شكێنن و ڕێ له سنوورشكاندنه‌كانی ده‌گرن.

# باسی سێهه‌م

باوه‌ڕهێنان به قه‌ده‌ر، واته به‌وه‌ی كه هه‌موو شتێك به ته‌قدیر و ده‌ستنیشانكردنی خوای گه‌وره‌یه، یه‌كێكه له پایه‌كانی ئیمان.

به‌ڵگه بێ‌گومانه‌كانی قه‌ده‌ریش هێنده زۆرن كه له ژماره نایه‌ن، وا ئێمه لێره‌دا و له ناوه‌ندی پێشه‌كی‌یه‌كدا به شێوازێكی ساده و ئاشكرا ڕاده‌ی هێز و فراوانیی ئه‌م پایه ئیمانی‌یه ڕوون ده‌كه‌ینه‌وه.

**پێشه‌كی:**

هه‌موو شتێك پێش ئه‌وه‌ی ببێت و دوای ئه‌وه‌ش كه ده‌بێت، له كتێبێكدا نووسراوه. قورئانی پیرۆز له زۆر ئایه‌تی پیرۆزی‌دا به ڕاشكاوی ئه‌مه‌ی ڕاگه‌یاندووه، وه‌ك:

**﴿وَلا رَطْبٍ وَلا يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾** (الأنعام:٥٩).

ئنجا سه‌رجه‌می بوونه‌وه‌رانیش - كه قورئانی گه‌وره‌ی قودره‌تی خواوه‌نده - به ئایه‌ته‌كانی: ڕێسا و، هاوسه‌نگی و، ڕێكوپێكی و، ئیمتیاز و، وێنه‌كێشان و، ئارایشتدان و، ئایه‌ته ته‌كوینی‌یه‌كانی تری هاوچه‌شنیان، ته‌سدیقی ئه‌و حوكمه‌ی قورئان ده‌كه‌ن.

به‌ڵێ، نووسینه ڕێكوپێكه‌كانی كتێبی بوونه‌وه‌ران و هاوسه‌نگ بوونی ئایه‌ته‌كانی، شایه‌تن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه هه‌موو شتێك نووسراوه. به‌ڵگه‌ش له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه هه‌موو شتێك پێش ئه‌وه‌ی په‌یدا ببێت نووسراوه و ته‌قدیر كراوه، هه‌موو ئه‌و "بنه‌ما" و "تۆو" و "ئه‌ندازه" و "وێنانه"ن كه ده‌بن به شایه‌تی ڕاست له‌سه‌ری..

چونكه "تۆوه‌كان" - له ڕاستی‌دا - بریتین له چه‌ند وردیله سندووقێكی ناسك كه كارگه‌ی: (ك.ن) دایهێناون و، "قه‌ده‌ر"یش پێڕسته بچكۆله‌ی وێنه‌ی ئه‌وی تێدا داناوه و، توانستیش - به‌پێی ئه‌ندازه‌ی ده‌ستنیشانكراوی قه‌ده‌ر - موعجیزه مه‌زنه‌كانی خۆی له‌سه‌ر ئه‌و تۆوه بچووكانه بنیات ده‌نێت و له‌م پێناوه‌دا گه‌ردیله‌كان ده‌خاته كار. به‌و واتایه‌ی كه سه‌رجه‌می ئه‌و كار و ڕووداوانه‌ی به‌سه‌ر دره‌ختدا دێن له حوكمی ئه‌وه‌دان كه له

تۆوەکەیدا نووسرابن، چونکە تۆوەکان لە خۆیاندا سادەن و ماددەکانیشیان لە یەك دەچن و جیاوازییان لە نێواندا نییە.

پاشان میقدار و "ئەندازە"ی ڕێکخەری هەموو شتێك بە ئاشکرا "قەدەر" دەردەخات. ئەوەتا گەر بە وردی سەیری هەر زیندەوەرێك بکرێت دەردەکەوێت کە ئەو زیندەوەرە خاوەنی شێوە و ئەندازەیەکە و، دەڵێی لە قالبێك دەرهاتووە کە لەوپەڕی حیکمەت و وردەکاریدا بێت! بە ڕادەیەك کە دەری دەخات: وەرگرتنی ئەو ئەندازە و شکڵ و شێوەیە لە لایەن ئەو زیندەوەرەوە یان هی قالبێکی ماددیی نائاسایی وەهایە کە تابلێی پێچاوپێچ و سووچ و پەنا و لار و لەوێریی تێدا بێت.. یاخود توانستی خوای گەورە بە قالبێکی مەعنەویی زانیاری و هاوسەنگی قەدەر ئەو شکڵ و شێوەیەی بە بەر بڕیوە و کردوویەتە بەر ئەو درەختە یان ئەو زیندەوەرە.

ئێستا سەرنج لەم درەختە یان لەم زیندەوەرە بدە، دەبینیت گەردیلە کەڕ و کوێرە بێ گیانەکان، کە هیچ هەست و نەستێکیان تێدا نییە و شێوەشیان لە یەك دەچێت، لە گەشە کردنی شتان و ئەندامەکانی ئەو درەختە یان ئەو زیندەوەرەدا، دەجووڵێن و پاشان لە چەند سنوورێکی دیاری کراودا بە وێنەی یەکێکی شارەزا و زانا بە جێ و شوێنی سوود و بەروبوومەکان ڕادەوەستن، پاشان شوێنەکانیان دەگۆڕن بە چەشنێك کە دەڵێی ئامانجێکی یەکجار مەزنیان لەم جێ گۆڕینەدا ببێت!

واتە: "گەردیلەکان" بەپێی ئەم ئەندازە و قالبە مەعنەوییەی کە لە قەدەرەوە هاتووە و بەگوێرەی ئەو فەرمانە مەعنەوییەی کە لەو ئەندازەیەوە بۆیان دەردەچێت، دەجووڵێن و ڕەفتار دەکەن.

جا مادەم تا ئەم ڕادەیە قەدەر لە شتە ماددییە بینراوەکاندا ببێت و دەربکەوێت، ئەوا دەبێ بارودۆخی هەموو ئەو شتانەی کە هەن و ئەو وێنە و شێوانەش کە دەیانپۆشن و ئەو جموجوولانەش کە بە درێژایی ڕۆژگار ئەنجامیان دەدەن، بە هەمان جۆر، هەموویان شوێنکەوتەی ڕێکوپێکیی ئەندازە دیاری کراوەکانی "قەدەر" بن.

بەڵێ، دوو درەوشانەوەی قەدەر لە "تۆو"دا هەیە، واتە: بە دوو شێوە قەدەری تێدا دەردەکەوێت:

یەکەم: دەرکەوتنێکی "بەدیهی"یە و، بە ئاماژە "کیتابی موبین" دەردەخات، کە ناونیشانی ویستی خوای گەورە و فەرمانە تەکوینییەکانە.

دووهەم: دەرکەوتنێکی "نەزەری"یە، واتە: بە ژیری پەیی پێ دەبرێت. ئەم یەکەیان بە هێما "ئیمامی موبین" ڕادەگەیەنێت کە ناونیشانی فەرمان و زانستی خوای گەورەیە.

هەرچی "قەدەری بەدیهی"یشە بریتی‌یە لە: بارودۆخ و، چۆنێتی و، شکڵ و شێوە "ماددی"یەکانی ئەو درەختە، کە هەموویان لەو تۆوەدا دانراون و لە پاشەڕۆژدا بەرجەستە دەبن و بە چاو دەبینرێن.

"قەدەری نەزەری"ش بریتی‌یە لەو بارودۆخ و شکڵ و شێوە و جموجوڵ و تەسبیحاتانەی "درێژایی ژیانی درەخت" کە لەو تۆوە بەدی دەهێنرێن و بە "مێژووی ژیانی درەخت" ناو دەبرێن. جا ئەو بارودۆخ و شکڵ و شێوە و کاروبارانە، هەموو کاتێك ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە ئەندازەیەکی قەدەریی ڕێکوپێکیان هەیە. وەك بە ئاشکرا لە پەل و گەڵای درەختەکاندا دەبینرێت.

جا ئەگەر لە شتە ئاسایی و سادەکاندا "قەدەر" ئاوا دەربکەوێت، ئەوا دەبێ شتان - پێش بوون و پەیدابوونیان - هەموویان لە کتێبێکدا نووسرابن. ئەمەش دەتوانرێت بە کەمێك بیر لێکردنەوە مرۆڤ لێی تێبگات و پەیی پێ ببات.

بەڵگەی ئەوەش کە: هەموو شتێك - دوای پەیدابوونی - مێژووی ژیانەکەی نووسراوە، ئەو گشت بەروبوومانەیە کە هەواڵی "کیتابی موبین" و "ئیمامی موبین"مان دەدەنێ و.. هێزی پارێزکار(الحافظة)ی مرۆڤیشە کە ئاماژە بۆ "لوح المحفــــوظ" دەکات و هەواڵی بوونی ئەو لەوحە ڕادەگەیەنێت.. هەموو یەکێك لەمانە، نیشانە و شایەتێکی ڕاستن لەسەر نووسراویی مێژووی ژیانی شتان لە دوای پەیدابوونیان.

بەڵێ، "تۆو"ی هەموو بەرێك - کە لە حوکمی دڵی ئەو بەرەدایە - دواڕۆژ و مێژووی ژیانی سەرجەمی بەسەرهاتەکانی درەختەکەی تێدا دەنووسرێن.

هەروەها هێزی پارێزکاری مرۆڤیش - کە لە بچووکی‌دا هێندەی تۆوە خەرتەلەیەك دەبێت - دەستی "قودرەت"ی خوای گەورە زۆر بە وردی و بە قەڵەمی "قەدەر": مێژووی ژیانی مرۆڤ و بەشێك لە ڕووداوەکانی جیهانی ڕابوردووی ئەوی تێدا دەنووسێت. وەك بڵێی "هێزی پارێزکار"ی مرۆڤ بەڵگەنامە و پەیماننامەیەکی بچووکی لاپەڕەی کردەوەکان(صحيفة الأعمال) بێت و، دەستی قودرەت دابێتی بە مرۆڤ و، لە گۆشەیەکی مێشکی‌دا بۆی دانابێت، تاکو یادی کاتی لێپرسینەوەی پێ بکاتەوە و دڵنیاشی بکات کە دروستکردنی ئەم ئاڵوگۆڕ و فەنا و زەوال و نەمانانە بۆ ئەوەیە کە ئاوێنەی "مانەوە" بن و خواوەندی بەتواناش وێنەی (هوية)ی[1] شتانی فانی و لەناوچوویان تێدا دەکێشێت و، چەند لەوحێکن کە خواوەندی پارێزکاری زانا واتای شتە فانی‌یەکانیان تێدا دەنووسێت.

---

(١) هوية: زاراوەیەکی فەلسەفی‌یە، واتە: ئەو حەقیقەتە ڕەهایەی کە ڕاستی‌یەکان لە ئامێز دەگرێت، کتومت وەك ئەو تۆوەی کە درەختەکەی لەخۆ گرتووە. بڕوانە: "التعريفات للجرجانـــي ص١٤٠". (وەرگێڕ)

**لەمانەی پێشەوە تێدەگەین کە:**

لە کاتێکدا ژیانی ڕووەك، کە نزمترین و سادەترینی جۆرەکانی ژیانە، تا ئەم ڕادەیە ملکەچی ڕێسای "قەدەر" بێت، ئەوا دەبێ ژیانی مرۆڤ، کە لە بەرزترینی پلەکانی ژیاندایە، بە خۆی و سەرجەم بەش و لق و پەلەکانیەوە، بە قەڵەمی "قەدەر" نووسرابێت و شێوەکانیشیان بە پێوەری قەدەر کێشرابێت.

بەڵێ، هەروەك دڵۆپە بارانەکان هەواڵی هەوریان پێیە و، نمی ئاوەکانیش بەڵگەی بوونی کانیاوەکانن و، بەڵگەنامەکانیش ئاماژە بۆ بوونی تۆمارە گەورەکان دەکەن.. بە هەمان جۆر: بەری درەخت و، ئاوی مەنی و، ناوك و تۆوەکان و، وێنە و شێوەکان، کە لەبەر چاوماندان و لە حوکمی چەند نمێکی قەدەری بەدیهی (واتە ڕێکوپێکیی ماددیی ناو زیندەوەران)دان و، وەك چەند دڵۆپێکی قەدەری نەزەری (واتە ڕێکوپێکیی مەعنەوی و زیندەیی) وان و، بە وێنەی بەڵگەنامەکانی ئەو قەدەرە نەزەرییەن.. هەموو ئەمانە، بە هەمان جۆر و بە بێ گومانی، دەبن بە بەڵگە لەسەر:

"کیتابی موبین" کە تۆماری ویستی خوا و فەرمانە تەکوینییەکانیەتی و..

"ئیمامی موبین"یش کە لەوحی مەحفووز و دیوانی زانیاریی خوای گەورەیە.

**ئەنجام:**

مادەم ئێمە دەبینین کە: یەك بە یەکی گەردیلەکانی هەموو زیندەوەرێك، لە دەمی نەش و نما و گەشەکردنیدا، بەرەو چەند سنوور و کۆتاییەکی لار و پێچاوپێچ دەڕوات و لەوێ ڕادەوەستێت و ئنجا ڕێگاکەی دەگۆڕێت تاکو لەو کۆتاییانەدا حیکمەت و سوود و بەرژەوەندی بەرهەم بهێنێت، ئەوا بە ئاشکرا و بەداهەت دەزانرێت کە: وێنەی ئەندازەی ڕواڵەتیی ئەو شتە بە قەڵەمی قەدەر نووسراوە.

بەم جۆرە، "قەدەری بەدیهی و بینراو" دەبێت بە بەڵگە لەسەر ئەو سنوورە ڕێکوپێك و بەرهەم بەخش و کۆتاییە بەسوودانەی حاڵەتە مەعنەوییەکانی ئەو زیندەوەرانە، کە ئەوانیش بە قەڵەمی قەدەر وێنەیان کێشراوە. کەواتە "قودرەت" سەرچاوەیە و "قەدەریش" ڕاستەیە، قودرەت لەسەر ڕاستەی قەدەر ئەو کتێبە مەعنەوییەی واتا و ناوەرۆکەکانی ئەو زیندەوەرە دەنووسێت و شێوەکەی دەکێشێت!

مادەم بە بێ گومانی پەی دەبەین بەوەی کە هەرچی سنوور و بەروبووم و کۆتایی خاوەن حیکمەت هەن، تێکرا بە قەڵەمی قەدەری ماددی و مەعنەوی وێنەیان کێشراوە، ئەوا دەبێ سەرجەمی ئەو حاڵەت و بارودۆخانەی زیندەوەریش کە لە درێژایی ژیانیدا بەسەریان

ده‌بات، به‌ هه‌مان جۆر به‌ قه‌ڵه‌می ئه‌و قه‌ده‌ره‌ نووسرابن و وێنه‌یان كێشرابێت، چونكه‌ هه‌رچه‌ند له‌ ماوه‌ی ژیانی‌دا چه‌ندین وێنه‌ و شكڵ و شێوه‌ ده‌گۆڕێت، كه‌چی مێژووی ژیانی به‌ ڕێكوپێكی و به‌پێی ڕێسا به‌سه‌ر ده‌چێت. جا مادام قه‌ڵه‌می قه‌ده‌ر به‌سه‌ر هه‌موو زینده‌وه‌راندا فه‌رمانڕه‌وا و ده‌سته‌ڵاتدار بێت، بێ گومان ده‌بێ مێژووی ژیانی مرۆڤیش - كه‌ كامڵترینی به‌روبوومی دره‌ختی جیهان و، جێنشینی زه‌وی و، هه‌ڵگری ئه‌مانه‌تی هه‌ره‌ مه‌زنه‌ - له‌ هه‌موو شتێك زیاتر ملكه‌چی "یاسای قه‌ده‌ر" بێت.

**گه‌ر كه‌سێك بڵێت:**

قه‌ده‌ر كه‌له‌پچه‌ی كردووین و سه‌ربه‌ستیی لێ سه‌ندووینه‌ته‌وه‌، ئایا نابینیت "ئیمان به‌ قه‌ده‌ر" قورسایی ده‌هاوێته‌ سه‌ر "دڵ" و بێزاریش له‌ "گیان"دا په‌یدا ده‌كات، له‌ كاتێكدا كه‌ دڵ و گیان تاسه‌مه‌ندی سه‌ربه‌ستی و بڵاوبوونه‌وه‌ و گه‌شت و گه‌ڕانن؟

**له‌ وه‌ڵامدا ده‌ڵێین:**

نه‌خێر هه‌رگیز وا نی‌یه‌.. "قه‌ده‌ر" هه‌روه‌ك نابێت به‌ مایه‌ی دڵته‌نگی، له‌ هه‌مان كاتیشدا ڕۆح سووكی و حه‌وانه‌وه‌ و دڵخۆشی و ڕووناكی‌یه‌كی هێنده‌ بێ‌سنوور به‌ دڵ و گیانی مرۆڤ ده‌به‌خشێت كه‌ ئاسایش و ئارامی و حه‌وانه‌وه‌ و دڵنیایی بۆ مرۆڤ ده‌هێنێته‌دی..

چونكه‌ ئه‌گه‌ر مرۆڤ ئیمانی به‌ "قه‌ده‌ر" نه‌بێت ده‌بێ له‌ بازنه‌یه‌كی ته‌سك و له‌ نێوان سه‌ربه‌ستی‌یه‌كی جوزئی و خۆرزگاركردنێكی كاتی‌دا، به‌ ئه‌ندازه‌ی دنیا كۆڵی قورس له‌ ئه‌ستۆی لاوازی "گیان"ی خۆی بنێت! چونكه‌ مرۆڤ له‌ لایه‌كه‌وه‌ په‌یوه‌ندیی له‌گه‌ڵ سه‌رانسه‌ری بوونه‌وه‌راندا هه‌یه‌ و، ئامانج و ئاواته‌كانیشی - له‌ لایه‌كی تره‌وه‌ - ئه‌وه‌نده‌ زۆرن كه‌ هه‌ر كۆتایی‌یان پێ نایه‌ت، كه‌چی له‌ به‌رامبه‌ر هه‌موو ئه‌وانه‌وه‌ توانست و ویست و سه‌ربه‌ستی‌یه‌كه‌ی خۆی هێنده‌ كه‌م و ده‌ست‌كورته‌ كه‌ هێشتا به‌شی هێنانه‌دیی یه‌ك له‌ ملیۆنی ئه‌و ئامانج و ئاواتانه‌ی ناكه‌ن!!

ئا لێره‌دا تێ‌ده‌گه‌ین كه‌ ئه‌گه‌ر مرۆڤ ئیمانی به‌ قه‌ده‌ر نه‌بێت چه‌نده‌ گرفتاری قورسایی مه‌عنه‌وی ده‌بێت و تا چه‌نده‌ش جیهانه‌ مه‌عنه‌وی‌یه‌كه‌ی سامناك و ترسناك ده‌رده‌چێت!

به‌ڵام "ئیمان به‌ قه‌ده‌ر" وا له‌ مرۆڤ ده‌كات كه‌ هه‌موو ئه‌و كۆڵانه‌ له‌ ئه‌ستۆی خۆی دابماڵێت و بیانخاته‌ ناو كه‌شتیی قه‌ده‌ره‌وه‌! كه‌ ئه‌مه‌ش ده‌بێته‌ مایه‌ی ئه‌وه‌ی حه‌وانه‌وه‌یه‌كی ته‌واوی پێ ببه‌خشێت و، به‌م ئیمانه‌ مه‌یدانێكی یه‌كجار فراوانی هاتوچۆ كردن له‌ به‌رده‌م "گیان" و "دڵ"ی مرۆڤدا ده‌كرێته‌وه‌ و له‌ ڕێی گه‌یشتنیان به‌ كه‌ماڵاتیاندا به‌ سه‌ربه‌ستی‌یه‌كی ڕاسته‌قینه‌ و ته‌واو له‌و مه‌یدانه‌دا ده‌ڕۆن و هه‌نگاو ده‌نێن.

هەر ئەم ئیمانە، سەربەستی‌یە جوزئی‌یەکەی دەروونی بەدخواز(النفس الأمارة بالسوء) لەو دەروونە دەسێنێتەوە و، فیرعەونایەتی و پەروەردگاریێتی‌یەکەی دەشکێنێت و، لە هەڵسوکەوتە چەواشە و هەڵەشەکانی کەم دەکاتەوە و سنوورێکیان بۆ دادەنێت.

"ئیمان بە قەدەر" هێندە بەلەزەتە کە هیچ تام و چێژێکی دیکەی پێ ناگات و بەختەوەری‌یەکە هیچ بەختەوەری‌یەکی تری لە دوا نی‌یە! جا لەبەر ئەوەی ناتوانین پێناسەی "لەزەت" و "بەختەوەری" بکەین، ناچارین بەم نموونەیەی خوارەوە پەنجەیان بۆ رابکێشین:

دوو پیاو پێکەوە دەڕۆن بۆ پایتەختی پادشایەکی مەزن و دەچنە ناو کۆشکی پڕ لە شتانی سەیر و سەرسووڕهێنەری پادشاوە. یەکێکیان: پادشا ناناسێت و، دەیەوێت بە دزی‌یەوە لەناو کۆشکەکەدا نیشتەجێ ببێت و، ژیانی لەوێدا بە زەوت‌کردنی ئەو ماڵ و سامانانە بەسەر بەرێت و، لەناو باخچەی کۆشکەکەدا کار بکات. بەڵام بەڕێوەبردن و کار بەڕێ کردنی ئەو باخچەیە و ڕێکخستنی دەرامەتەکانی و بەگەڕخستنی مەکینە و ئامێرەکانی و ڕۆزی دانی زیندەوەرە نامۆ و سەیرەکانی و کارە قورسەکانی تری هاوچەشنی ئەمانە، گرفتاری نیگەرانی و دڵەڕاوکێ‌یەکی بەردەوامیان کرد، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە ئەو باخچە ڕەنگینە بەهەشت ئاسایەی لە بەرچاودا وەك دۆزەخێك لێ هات و نەیدەتوانی تیای‌دا بژی، چونکە خەفەت و ئازاری بەدەست هەموو ئەو شتانەوە دەچەشت کە لە سەرپەرشتی کردن و بەڕێوەبردنیاندا دەستەوسان دەبوو، هەردەم کاتەکانی بە ئاخ و حەسرەت و پەژارەوە بەسەر دەبرد. تا لە ئەنجامدا، لە تۆڵەی بێ ئەدەبی و ڕەفتاری هەڵە و خراپی خۆی و بۆ مەبەستی تەمێ کردنی، خرایە ناو بەندیخانەوە.

بەڵام پیاوی دووهەم: پادشا دەناسێت و، خۆی بە میوانی ئەو دادەنێت و، لەو باوەڕەدایە کە: سەرجەم کاروبارەکانی کۆشك و باخچەکە بەوپەڕی ئاسانی و بەپێی ڕێسا و یاسا و لەسەر بەرنامە و نەخشە و پلانێکی دەستنیشان‌کراو بەڕێوە دەبرێن و، هەرچی قورسی و ئەرکی سەخت هەن بە یاسای پادشای دەسپاردن و، بە دڵنیایی‌یەکی تەواوەتی و بێ‌گەردی‌یەکی تەواو سوودی لە چێژ و لەزەتەکانی ئەو باخچە ڕەنگینە بەهەشت ئاسایە وەردەگرت و، دەیبینی هەموو شتێك بە ڕاستی جوانە و، پشتی بە سۆز و بەزەیی پادشا و جوانیی یاسا کارگێڕەکانی ئەو دەبەست.. بەم جۆرە، ژیانی خۆی لەوێدا، لە ناوەندی چێژ و لەزەت و بەختەوەریی تەواوەتی‌دا، بەسەر دەبرد.

بۆ خۆت لەم نموونەیەوە لە نهێنی‌یەکی: "مَنْ آمَنَ بالقَدَرِ أَمِنَ مِنَ الكَدَرِ" تێ‌بگە!

# باسی چوارەم

**ئەگەر دەڵێیت:** لە باسی یەکەمدا چەسپێنرا کە هەموو شتێکی قەدەر خێر و جوانە، تەنانەت ئەو شەڕەش کە لە قەدەرەوە دێت هەر خێرە و ناشیرینی‌یەکەشی جوانە.. بەڵام خۆ ئەو بەڵا و موسیبەتانەی کە لەم خانەیەی دنیادا نازڵ دەبن ئەم بڕیارە زامدار دەکەن و ئەم چەسپانەش لە جێی خۆی‌دا دەلەقێنن؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

ئەی نەفسی خۆم و ئەی هاوڕێکەم!

ئەی ئەو دوانەی کە لەبەر سۆز و شەفەقەتی لەسنووربەدەرتان ئازاری زۆر دەچێژن!

بزانن کە:

"بوون" سەرانسەر خێرە و.. "نەبوون"یش سەرتاپا شەڕ و خراپەی بێ گومانە. بەڵگەش لەسەر ئەمانە بریتی‌یە لەوەی کە هەرچی چاکە و کەمالات و ڕەوشت و خووی باش هەن هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ "بوون" و، بناغەی سەرجەمی گوناهەکان و بەلا و موسیبەت و ناتەواوی‌یەکانیش "نەبوون"ە.

جا لەبەر ئەوەی "نەبوون" شەڕێکی سەرتاسەری‌یە، ئەوا ئەو حاڵەت و بارودۆخانەی کە ئەنجامەکانیان "نەبوون"ە یان بۆنی "نەبوون"یان لێ دێت، ئەوانیش بە هەمان جۆر شەڕیان لەخۆ گرتووە. لەبەر ئەوە، ئەو "ژیان"ەی کە درەخشانترین ڕووناکیی "بوون"ە بە ئاڵوگۆڕ بوونی لە نێوان چەند حاڵەتێکی جۆراوجۆردا، بەهێز دەبێت و.. بە چەند بارودۆخێکی جیاجیا کە دێنە ڕێی، پاڵفتە دەبێت و.. بەو چۆنێتی‌یە جۆراوجۆرانەی کە دەیانگرێتە خۆ، ئەو بەروبوومانە بەرهەم دەهێنێت کە لێیەوە چاوەڕوان دەکرێن و.. بەو قۆناغە جیاجیایانەش کە یەك لە دوای یەك دەیانگۆڕێت، نەخش و نیگارەکانی ناوە جوانەکانی "بەخشندەی ژیان" بە چەشنێکی ناسك و نیان ڕوون دەکاتەوە.

لەسەر بناغەی ئەم ڕاستی‌یە، گەلێ حاڵەت و بارودۆخی جیاجیا لە شێوەی: ئازار و بەلا و موسیبەت و گیروگرفتدا دێنە ڕێی زیندەوەران و، بەمانەش ڕووناکی‌یەکانی "بوون" لە ژیانی ئەواندا بەردەوام نوێ دەبنەوە و، تاریکایی‌یەکانی "نەبوون"یشیان لێ دوور دەکەوێتەوە و، بەم پێیە ژیانیان پاڵفتە دەبێت و خاوێنی بەدەست دەهێنێت. چونکە وەستان و، بێدەنگی و، بێ کاری و، حەوانەوە و، بەردەوامبوونی هەر شتێك لەسەر دۆخ و ڕەوتی خۆی.. بە "نەبوون" دادەنرێت لە چۆنێتی و بارودۆخەکانی ئەو شتانەدا. تەنانەت لەو

حاڵەتانەدا کە شتان لە یەك دۆخدا دەمێننەوە و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا نایەت، مەزنترین تام و چێژ، بەرە بەرە، کەم دەکاتەوە و لەزەتی خۆی لەدەست دەدات.

**پوختەی ئەم قسانە:**

مادەم "ژیان" نەخشونیگاری ناوە جوانەکان دەردەخات، ئەوا هەر شتێکیش بێتە ڕێی ئەو ژیانە هەر بە جوان دادەنرێت.

بۆ نموونە: سنعەتکارێکی کارامەی دەوڵەمەند، پیاوێکی هەژار بە کرێیەکی دیاریکراو دەگرێت تاکو بۆ ماوەی یەك سەعات دەوری "مۆدێل" ببینێت لە پیشاندانی ئاسەواری سنعەتە جوانەکانی ئەو سنعەتکارە و دەرخستنی مەودای سەروەتە بەنرخەکەیدا. ئیتر بۆ ئەم مەبەستە بەرگێکی یەکجار جوان و ناوازەی چنراوی سنعەتی خۆی لەبەر دەکات و چەند کردار و بارودۆخ و شێوەیەکی جۆراوجۆر بەو کرێکارە ئەنجام دەدات و تاوێك بەرگێکی کورتی لەبەر دەکات و تاوێك بەرگێکی درێژ، تاوێکی تر ئەو بەرگەی بەری دەبڕێت و لێی دەقرتێنێت و تاوێکی دی دەیگۆڕێت... هتد. هەموو ئەمانەش لە پێناوی دەرخستنی کارە دەراساکانی سنعەتی خۆی و ناوازەیی کارامەییەکەی..

ئایا ئەو هەژارەی کە بە کرێ ئەو کارەی گرتە ئەستۆ، مافی ئەوەی هەیە بەو سنعەتکارە کارامەیە بڵێت: "تۆ کە داوام لێ دەکەیت تاوێك خۆم لار بکەمەوە و تاوێکی تر ڕاست ببمەوە، ماندووم دەکەیت و.. بە بڕین و کورتکردنەوەی ئەم کراسە جوانەی بەریشم ڕوخساری کراسەکە دەشێوێنیت"؟ یان مافی ئەوەی هەیە پێی بڵێت: "ستەمت لێ کردم و بێ ویژدانیت لەگەڵدا بەکار هێنام"؟!

کردگاری مەزن و بەدیهێنەری خاوەنی جوانیش – ولله المثل الأعلی – بە هەمان جۆرە، چونکە هەردەم ئەو کراسە دەگۆڕێت کە کردوویەتیە بەر گیانداران و، چەند حاڵەتێکی زۆریان بەسەردا دەهێنێت بۆ ئەوەی نەخش و نیگاری ناوە جوانەکانی خۆی دەربخات و، هەمیشە ئاڵوگۆڕ دەهێنێت بەسەر ئەو کراسەی کە بە لایەنە ناسك و هەست و نەستەکانی چەشنی چاو و، گوێ و، دڵ و، ژیری و، هاوچەشنیان ڕازاندوویەتیەوە.

جا لە نێوان ئەو بارودۆخانەی کە بەڵا و موسیبەتیان لە ئامێز گرتووە، چەند نوورێکی جوانییەکی ناسك و نیان هەیە، کە بۆ مەبەستی دەرخستنی حوکمی هەندێ لە ناوە جوانەکان و، لە ناوەندی بریسکانەوەی حیکمەتی خوای گەورەدا، تیشکەکانی میهرەبانیی ئەو خواوەندەیان تێدا دەردەکەوێت.

# كۆتایی

**(ئه‌مانه‌ی خواره‌وه‌ پێنج بڕگه‌ن كه‌ ده‌روونی به‌دخوازی نه‌زان و بــه‌خۆناز و له‌خۆبایی و ڕیاكار و له‌ خۆڕازی‌بووی سه‌عیدی كۆنیان ده‌مكوت كرد)!**

**بڕگه‌ی یه‌كه‌م:**

مادده‌م شتان هه‌ن و به‌ وردی دروست كراون، ئه‌وا ده‌بێ سنعه‌تكارێكی كارامه‌ دروستی كردبن. چونكه‌ له‌ وته‌ی بیست و دووهه‌مدا به‌ شێوه‌یه‌كی گومان‌بڕ چه‌سپاندمان كه‌:

ئه‌گه‌ر به‌دیهێنانی سه‌رجه‌می شتان نه‌درێنـه‌ پـاڵ خـوای تـاك و تـه‌نیا، ئـه‌وا به‌دیـهێنانی هـه‌ر شتێك به‌ ئه‌ندازه‌ی به‌دیـهێنانی هـه‌موو شتان دژوار ده‌بێـت و.. ئه‌گـه‌ر دروستكردنی هـه‌موو شتانیش بدرێنه‌ پاڵ خواوه‌ندی تاكی ته‌نیا، ئـه‌وا هێنـده‌ی ئاسـانیی به‌دیـهێنانی یـه‌ك دانـه‌ شت به‌دیهێنانی هه‌موو شتان ئاسان ده‌بێت!

جـا مـادده‌م ئـه‌و كه‌سـه‌ی كـه‌ ئاسمانـه‌كان و زه‌ویـی دروسـت كـردووه‌ خواوه‌نـدی تـاك و تـه‌نیایه‌، ئه‌وا هه‌رگیز ئه‌و داهێنكاره‌ ناوازه‌ و دانایه‌: بـه‌روبووم و ئه‌نجام و ئامانجه‌كانی زه‌وی و ئاسمانـه‌كان – كـه‌ گیـانداره‌ خـاوه‌ن ژیانـه‌كانن – بـه‌ غـه‌یری خـۆی ناسـپێرێت، نـه‌بادا كاروباره‌كان تێكبچن و، هه‌رگیز ناشـیانداته‌ ده‌سـت كه‌سـانی تـر بـۆ ئـه‌وه‌ی گاڵتـه‌ بـه‌ كـاره‌ خاوه‌ن حیكمه‌ته‌كانی نه‌كرێت و، ئه‌و به‌روبووم و ئاكام و ئامانجانه‌ش له‌ناو نابـات و هـه‌رگیز په‌رستش و شوكرانه‌شیان به‌ غه‌یری خۆی ناسپێرێت!

**بڕگه‌ی دووهه‌م:**

ئه‌ی نه‌فسی له‌خۆباییم! له‌ خۆت بایی مه‌به‌ و شـانازی مه‌كه‌! چونكـه‌ تـۆ لـه‌ "قـه‌دی مێـو" ده‌چیت، ئه‌وه‌تا ئه‌و قه‌ده‌ خۆی هێشووه‌ ترێكانی به‌ خۆدا هه‌ڵنه‌واسیوه‌، بـه‌ڵكو غـه‌یری خـۆی ئه‌و هێشووانه‌ی پێدا هه‌ڵواسیون!!

**بڕگه‌ی سێهه‌م:**

ئه‌ی نه‌فسـی ڕیاكـارم! نه‌كـه‌یت لـه‌ خـۆت بـایی ببیـت و بڵێیـت: "مـن خزمـه‌تی ئـایینم كردووه‌". چونكه‌ فه‌رمووده‌ی پیرۆز به‌ ڕاشكاوی ده‌فه‌رموێت: "إنّ الله ليؤيّد هـذا الدّين

بالرّجل الفاجر"[١] کەواتە دەبێ تۆ خۆت بەو مرۆڤە فاجرە دابنێیت، چونکە تۆ دەروونێکی پاکژ نەکراویت!

ئەوەش بزانە کە خزمەتگوزاری‌یەکانت بۆ ئایین و پەرستشەکانت، لە ڕاستی‌دا بریتین لە: شوکرانەبژێریی ئەو نیعمەتانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوویت و، ئەنجامدانی فەرمانبەریی فیترەت و، بەجێهێنانی فەرزی ئەستۆی بەدیهێنانت و، ئاکامی سنعەتی خوای گەورە لە تۆدا. ئەمە باش بزانە و خۆت لە: ڕیاکاری و لەخۆ ڕازی بوون، ڕزگار بکە!

**برگەی چوارەم:**

ئەگەر دەتەوێت زانستی حەقیقەت و دانایی ڕاستەقینەت دەست بکەوێت، ئەوا "خواناسی" بەدەست بهێنە! چونکە حەقیقەت و ڕاستیی گشت بوونەوەران چەند تیشکێکی ناوی "الحق"ی خوای گەورەن و، جێی درەوشانەوەی ناوە جوانەکان و سیفەتە مەزنەکانی ئەون.

ئەوەش بزانە کە "ڕاستیی" هەموو شتێك، چ ماددی بێت چ مەعنەوی، چ شتێکی جێگیر بێت و چ شتێکی کاتی و لەناوچوو بێت، هەریەکەیان پاڵیان بە نوورێکی ناوە جوانەکانی خوای گەورەوە داوە و لەسەر حەقیقەتێك دامەزراوە. دەنا وێنە و شێوەیەکی دوور لە "ڕاستی" و بێ گرنگی و بایەخ دەبێت.

لە کۆتایی وتەی بیستەمدا شتێکمان لەم بابەتە باس کردووە.

**ئەی نەفسەکەم!**

ئەگەر تۆ تاسەمەندی ئەم دنیایت و لە مردن هەڵدێیت، ئەوا بە دڵنیایی بزانە کە ئەو شتەی بە گومانی خۆت بە ژیانی دادەنێیت تەنها ئەو "خولەکە"یە کە تیایدایت و، کاتەکانی پێش ئەم خولەکە و شتە دنیایی‌یەکانی ناویشیان، هەمویان مردوون.. ئنجا کاتی دوای ئەم خولەکە و شتانی ناویشی سەرانسەر هیچ و "نەبوو"ن!

واتە ئەو ژیانە فانی‌یەی کە پێوەی دەنازیت و پێی مەغروور بوویت تەنها یەك دەقیقەیە، تەنانەت هەندێ لە کەسانی وردکاری ئەهلی تەدقیق وتوویانە: ژیان تەنها دەهەم بەشی یەك لەسەر دەی دەقیقەیەکە، بگرە یەك ئانی بە خوڕەمە! ئا لێرەوەیە کە هەندێ لە ئەولیا و پیاوچاکان دنیایان بە "عەدەم" داناوە لەو ڕووەوە کە دنیایە.

---

(١) روى البخاري أن النبي ﷺ قال لبلال: قم فأذّن لا يدخل الجنة الاّ مؤمن وانّ الله ليؤيد هذا الديـــن بـــالرجل الفاجر. (وەرگێڕ)

جا مادەم وایه ئەوا تۆش – ئەی نەفسەكەم! – واز لە ژیانی ماددی و نەفسی بهێنه و، بە پلەكانی ژیانی "دڵ و ڕۆح و سیڕ"دا سەربكەوه و، بڕوانه كه چەندە بازنەی ژیانی ئەمانە فراوانە! ئەوەتا ئەو ڕابوردوو و داهاتووەی كه سەبارەت بە تۆوە مردوون كەچی سەبارەت بەوان زیندوون و خاوەنی وجوودن.

مادەم وایه..

ئەی نەفسەكەم! تۆش وەك "دڵ"م..

بە ئەشكی گەش

هانا بۆ فریادڕەس بەرە.

بڵێ: من خۆم "فانی"م.. ئیتر "فانی"م ناوێ..

دەستەوسانم.. كۆڵەوارم..

شتی "دەستەوسان"م ناوێ!

"ڕۆح"ی خۆمم بە خواوەندی "ڕەحمان" سپارد..

هیچ كەسێكی دیكەم ناوێ!

بەڵكو تەنها ئەوم دەمەوێ..

یاری باقیی فانی‌نەبووی تاكم دەوێ.

من گەردیلەم..

بەڵام خۆری ئاوانەبووی هەمیشه بێ‌باكم دەوێ.

خۆم لە خۆمدا: هیچی تەواو هیچم، كەچی:

سەرانسەری بوونەوەری پاكم دەوێ.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەم بڕگەیه بە زمانی عەرەبی بە دڵدا هات و هەر بەو جۆرەش بە زمانی عەرەبی نووسرا و، ئاماژەیه بۆ یەكێك لە سی و سێ پلەكانی زیكری "الله أكبر":

"الله أكبر، إذ هو القدير العليم الحكيم الكريم الرحيم الجميل النقاش الأزلي الذي ما حقيقة هذه الكائنات كلاً وجزءاً وصحائفَ وطبقاتٍ، وما حقائق هذه الموجودات كلياً وجزئياً ووجوداً وبقاءً إلاّ:

خطوط قلم قضائه وقدره وتنظيمه وتقديره بعلمٍ وحكمة..

ونقوش بركار علمه وحكمته وتصويره وتدبيره بصنعٍ وعناية..

وتزيينات يد بيضاء صنعه وعنايته وتزيينه وتنويره بلطفٍ وكرم..

وأزاهير لطائف لطفه وكرمه وتودده وتعرفه برحمة ونعمة..

وثمرات فياض رحمته ونعمته وترحمه وتحننه بجمالٍ وكمال..

ولمعات وتجليات جماله وكماله بشهادات تفانية المرايا وسيالية المظاهر مع بقاء الجمال المجرد السرمدي، الدائم التجلي والظهور، على مرّ الفصول والعصور والدهور، ودائم الإنعام على مرّ الأنام والأيام والأعوام.

نعم، فالأثر المكمّل يدل ذا عقل على الفعل المكمّل..

ثم الفعل المكمّل يدل ذا فهم على الإسم المكمّل..

ثم الإسم المكمّل يدل بالبداهة على الوصف المكمّل..

ثم الوصف المكمّل يدل بالضروره على الشأن المكمّل..

ثم الشأن المكمّل يدل باليقين على كمال الذات بما يليق بالذات وهو الحق اليقين.

نعم تفاني المرآة.. زوال الموجودات.. مع التجلي الدائم.. مع الفيض الملازم: من أظهر الظواهر أنّ الجمال الظاهر ليس ملك المظاهر.. من أفصح تبيان.. من أوضح برهان للجمال المجرد للإحسان المجدد للواجب الوجود.. للباقي الودود".

اللهم صلّ على سيدنا محمد من الأزل إلى الأبد عدد ما في علم الله وعلى آله وصحبه وسلم.

* * *

# پاشكۆ

**(ئه‌م پاشكۆ یه‌كجار كورته دارای گرنگی‌یه‌كی مه‌زن و سوودی زۆره بۆ هه‌موان)**

چه‌ندین ڕێی زۆر هه‌ن كه مرۆڤ به خوای گه‌وره ده‌گه‌یه‌نن، سه‌رچاوه‌ی هه‌موو ئه‌و ڕێ ڕاستانه‌ش "قورئانی پیرۆز"ه. به‌لام ئه‌وه‌نده هه‌یه هه‌ندێ له‌م ڕێیانه له‌چاو ئه‌وانی تردا گشتی‌تر و سه‌لامه‌تتر و نزیكتره.

من، وێڕای تێگه‌یشتنی كۆتا و ناته‌واوی خۆم، ڕێگایه‌كی ته‌خت و كورت و ئاسانم له ڕێژنه‌ی قورئانی پیرۆزه‌وه دۆزیوه‌ته‌وه، كه بریتی‌یه له ڕێی:

(كۆڵه‌واری، هه‌ژاری، شه‌فه‌قه‌ت، بیر كردنه‌وه).

به‌ڵێ، "كۆڵه‌واری"(العجز) وه‌ك عیشق وایه، ڕێ‌یه‌كه مرۆڤ به خوای گه‌وره ده‌گه‌یه‌نێت، به‌ڵكو ڕێگایه‌كه له عیشق سه‌لامه‌تتر و نزیكتره، چونكه له ڕێی "به‌ندایه‌تی"یه‌وه مرۆڤ ده‌گه‌یه‌نێته "مه‌حبووبییه‌ت".

"هه‌ژاری"ش وه‌هایه، مرۆڤ به ناوی پیرۆزی "الرحمن"ی خوای گه‌وره ده‌گه‌یه‌نێت.

"شه‌فه‌قه‌ت"یش به هه‌مان جۆر وه‌ك عیشق وایه، مرۆڤ به خوای گه‌وره ده‌گه‌یه‌نێت، به‌ڵكو له عیشق تیژڕه‌وتره و مه‌وداكه‌شی له‌و فراوانتره، چونكه مرۆڤ ده‌گه‌یه‌نێته ناوی پیرۆزی "الرحیم"ی خوای گه‌وره.

"بیر كردنه‌وه"ش وه‌ك عیشق وایه، ته‌نانه‌ت له‌ویش به‌پێزتره و ڕوونا كی‌یه‌كه‌شی دره‌وشاوه‌تره و ڕێ‌یه‌كی گه‌لێ به‌رینتره. چونكه ڕێبواری ئه‌و ڕێ‌یه ده‌گه‌یه‌نێته ناوی پیرۆزی "الحكیم"ی خوای گه‌وره.

ئه‌م ڕێ‌یه جیایه له‌وه‌ی كه له "ده" هه‌نگاو پێكهاتووه و ڕێبوارانی ڕێی نهێنی(الخفاء) گرتوویانه‌ته‌به‌ر.. هه‌روه‌ها جیایشه له‌وه‌ی كه له‌ڕێی ئاشكرا(الجهر)دا ده‌یگرنه‌به‌ر و بریتی‌یه له "حه‌وت" هه‌نگاو به‌پێی ژماره‌ی حه‌وت ده‌روونه‌كان..

ئه‌م ڕێ‌یه بریتی‌یه له ته‌نها "چوار" هه‌نگاو، ڕاستی‌یه‌كی شه‌رعیشه زیاتر تا ئه‌وه‌ی ته‌ریقه‌تێكی سۆفی بێت.

با به هه‌ڵه‌دا نه‌چن، مه‌به‌ست له: قسوور و كۆڵه‌واری و هه‌ژاری ئه‌وه‌یه كه هه‌موو ئه‌مانه ته‌نها له به‌رده‌م خواوه‌ندی مه‌زندا ده‌ربېڕێن، نه‌ك له به‌رده‌م خه‌ڵكی‌دا.

ویرد و زیکرەکانی ئەم ڕێیەش ئەمانەی خوارەوەن:

★ شوێن پێ هەڵگرتنی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ.

★ ئەنجامدانی فەرزەکان، بە تایبەتی بەجێهێنانی نوێژ بە ڕێکوپێکی و، خوێندنی زیکرەکانی دوایان.

★ دەست هەڵگرتن لە گوناهە گەورەکان.

سەرچاوەکانی ئەم هەنگاوانەش لە قورئانی پیرۆزدا، ئەمانەن:

﴿**فلا تُزكّوا أنفسَكُم**﴾ (النجم:٣٢) ئاماژە بۆ هەنگاوی یەکەم دەکات..

﴿**ولا تكُونوا كالّذين نسُوا الله فأنْساهُمْ أنفُسَهم**﴾ (الحشر:١٩) ئاماژە بۆ هەنگاوی دووهەم دەکات..

﴿**ما أصابَكَ مِن حَسَنَةٍ فَمِنَ الله وما أصابَك من سَيِّئَةٍ فمن نفسِك**﴾ (النساء:٧٩) ئاماژە بۆ هەنگاوی سێهەم دەکات..

﴿**كلُّ شيءٍ هالِكٌ إلاّ وَجْهَه**﴾ (القصص:٨٨) ئاماژە بۆ هەنگاوی چوارەم دەکات.

ڕوونکردنەوەی ئەم چوار هەنگاوە - زۆر بە کورتی - بەم جۆرەیە:

هەنگاوی یەکەم: وەك ئایەتی: ﴿**فلا تُزكّوا أنفسَكُم**﴾ ئاماژەی بۆ دەکات، بریتییە لەوەی: "نەفس" بە خاوێن لە قەڵەم نەدرێت. چونکە مرۆڤ، بەپێی سروشت و فیترەتی، ڕاستەوخۆ و لەپێشدا تەنها خۆی خۆش دەوێت و لە پێناویدا هەموو شتێك بەخت دەکات و بە چەشنێك بە شان و باڵای خۆیدا دەخوێنێت و مەدحێکی وای دەکات کە تەنها شایستەی خواوەند بێت و، هەردەم خۆی بە خاوێن لە قەڵەم دەدات، تەنانەت هیچ کەموکووڕییەکی بۆ ڕەوا نابینێت و بەرگرییەکی توندی تا ڕادەی پەرستنی لێ دەکات. وەك بڵێی هەموو ئەو ئامێرانەی خوای گەورە بۆ ستایش و پاك ڕاگرتنی خواوەند لەو مرۆڤەدا دایناون، ئەو مرۆڤە دەچێ بۆ خۆی بەکاریان دەهێنێت! بەم جۆرە ڕووبەڕووی ئەو وەسفە دەبێتەوە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیکات: ﴿**مَنِ اتَّخذَ إلهَهُ هَواهُ**﴾ (الفرقان:٤٣). ئیتر دووچاری لەخۆ ڕازی بوون و لەخۆ بایی‌بوون دەبێت و، پێویستی بەوە دەبێت کە پاکژ بکرێت.. جا پاکژکردنی دەروونی مرۆڤ لەم هەنگاوەدا بەوە دەبێت کە بە پاك نەزانرێت و بە خاوێن لە قەڵەم نەدرێت!

هەنگاوی دووهەم: ئەو دەرسەیە کە لەم ئایەتە پیرۆزەوە وەردەگیرێت:

﴿**ولا تَكُونوا كالّذين نسُوا الله فأنْساهُمْ أنفُسَهم**﴾.

ئەویش بەم جۆرە:

مرۆڤ هەردەم خۆی لەبیردەباتەوە، خۆ ئەگەر بیریش لـە مـردن بکاتـەوە، ئـەوا ڕووی ئـەو مردنە بۆ غەیری خۆی وەردەچەرخێنێت و، گەر لەناوچوون و نەمانیش ببینێـت، بـۆ کەسـانی تری دادەنێت، وەك بڵێی هـەرگیز ئـەو نەگرێتـەوە و هیـچ پەیوەندییـەکی بـە خۆیـەوە نـەبێت! هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەروونی بەدخوازی مرۆڤ لـە کـاتی بـەش و پاداشـت وەرگرتندا خۆی بیردەکەوێتەوە و بە تونـدی دەسـتی پێـوە دەگرێـت. کـەچی لـە کـاتی کـار و فرمان و خزمەتگوزاریدا خۆی لەبیردەباتەوە! کەواتە پاکژ و خاوێن و پەروەردەکردنی، لـەم هـەنگاوەدا، ڕەفتارکردنـە بـە پێچەوانـەی ئـەم حاڵەتـە. واتـە: خۆلەبیرنەچوونـەوە لـە دەمـی لەبیرچوونەوەدا. بـە واتایـەکی تـر: خۆلەبیربردنـەوە لـە کـاتی پاداشـت وەرگرتـن و، بـیر لێکردنەوەشی لە دەمی خزمەتگوزاری و یادی مردندا!

هەنگاوی سێهەم: ئەوەیە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ دەکات کە دەفەرموێ:

﴿ما أصابَكَ مِن حَسَنَةٍ فَمِنَ اللهِ وما أصابَكَ من سَيِّئَةٍ فمن نفسِكَ﴾.

چونکە هـەردەم "نـەفس" داخـوازی ئەوەیـە کـە هـەرچی خێـر و چاکەیـە بـە هـی خـۆی دادەنێت، ئەم کارەش بەرەو شانازی کردن و لەخۆڕازی بوونی دەبات. کەواتـە دەبێـت، لـەم هـەنگاوەدا، لـە: ناتـەواوی و کـەموکوڕی و کۆڵـەواری و هـەژاری بـەولاوە هیچـی تـر لـە خۆیدا نەبینێت و، هەموو چاکە و لایەنە تەواوەکانی خۆیشی بە چاکەی خواوەندی مەزنیان دابنێـت و بـە بەخشایشـی ئـەویان بزانێـت و، ئیـتر لـە بریـی شـانازی و لـەخۆ بـاییبوون، شوکرانەبژێری دەنوێنێت و سوپاسی خواوەند دەکات.

کەواتە پاکژ کردنی "نەفس" لەم پلەیەدا لە نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزەدایە کە دەفەرموێ:

﴿قد أفلحَ مَنْ زكّاها﴾ (الشمس:٩).

واتە بەوە دەبێت کە بزانێت:

تـەواویی خـۆی لـە ناتـەواوییدا و، توانـای لـە کۆڵـەواریی و، دەوڵەمەندییەکەشـی لـە هەژارییدایە. (بەو واتایەی کە بزانێت تەواویی خۆی لەوەدایە کە تەواو نەبێت و، دەستەڵاتی لەوەدایە کە لـە بەردەم خـوای گەورەدا کۆڵـەوار و بێ دەستەڵات بێـت و، دەوڵەمەندیشـی لەوەدایە کە هەژاری دەرگانەی ئەو بێت).

هەنگاوی چوارەم: ئەو وانەیەیە کە ئەم ئایەتە دەیڵێتەوە:

﴿كلُّ شيءٍ هالِكٌ إلاّ وَجْهَهُ﴾.

چونکە "نەفس" گومانی وایە کە خۆی لە خۆی‌دا سەربەست و سەربەخۆیە، لەبەر ئەوە لافی جۆرە پەروەردگاری‌یەك لێ دەدات و، بەرامبەر پەرستراوی ڕاستەقینەی خۆی سەرپێچیی تێدایە. جا هەستکردن بەم ڕاستی‌یەی خوارەوە مرۆڤ لەو بارە ڕزگار دەکات، ئەو ڕاستی‌یەش بریتی‌یە لەوەی کە:

هەموو شتێك لە خۆی‌دا و بە "واتا ئیسمی‌یەکەی" لەناوچوو، ونبوو، تازەپەیدابوو، نەبووە. بەڵام بە "واتا حەرفی‌یەکەی" و لەو ڕووەوە کە بەپێی ئەرك و فرمانی سەرشانی دەوری ئاوێنەی دەرخەری ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری مەزن دەبینێت، ئەوا ئەو شتە: بینەر و بینراوە و، هەیە و بووە.

جا پاکژکردنی "نەفس" لەم هەنگاوەدا بەوە دەبێت کە بزانێت: نەبوونی لە بوونی‌دایە و، بوونیشی لە نەبوونی‌دا! واتە: ئەگەر خۆی بینی و بوونی بە خۆی بەخشی، ئەوا لە تاریکستانی چەندین نەبوونی ئەوەندە زۆر و زەبەندەدا نوقم دەبێت کە بە ئەندازەی هەموو بوونەوەران دەبن.

بە واتایەکی تر دەڵێین: ئەگەر لە بەدیهێنەری ڕاستەقینەی خۆی - کە خوای گەورەیە - بێ ئاگا بێت و، بە بوونی خۆی بایی بێت، ئەوا خۆی بە تەنیایی و خنکاوی دەبینێتەوە لە ناوەندی تاریکیی بێ‌کۆتایی جودایی و نەبووندا. بە چەشنی گوڵەستێرە(الیراعة) کە تەنها بە ڕووناکی‌یە کزەکەی خۆی لە تاریکیی شەوی تاردا بجووڵێتەوە.

بەڵام کاتێ واز لە خۆویستی و لەخۆ بایی بوون دەهێنێت، بۆی دەردەکەوێت کە لە ڕاستی‌دا خۆی لە خۆی‌دا شتێك نی‌یە، بەڵکو ئاوێنەیەکی درەوشانەوەکانی بەدیهێنەری ڕاستەقینەیە. بەم پێ‌یە، لەم ڕێ‌یەوە "بوون"ێکی نەبڕاوە و بێ‌کۆتایی بەدەست دەهێنێت و، ئنجا "بوون"ی هەموو بوونەوەرانیش دەستکەوت و قازانجی دەبێت.

بەڵێ، ئەو کەسەی خوا دەدۆزێتەوە، هەموو شتێکی دەست کەوتووە، چونکە هەموو بوونەوەران، تێکڕا، بریتین لە: درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خواوەندی مەزن!

* * *

# کۆتایی ئەم پاشکۆیە

ئەم ڕێگایەی کە پێکهاتووە لەم چوار هەنگاوە: "کۆڵەواری و، هەژاری و، شەفەقەت و، بیرکردنەوە" لە هەر بیست و شەش وتەکانی پێشووی کتێبی "وتەکان"دا، کە لە: زانستی حەقیقەت و، ڕاستیی شەریعەت و، حیکمەتی قورئانی پیرۆز دەدوێن، ڕوون کراونەتەوە. بەڵام لێرەدا تەنها ئاماژەیەکی پوخت بۆ چەند خاڵێك دەکەین کە ئەمانەن:

ئەم ڕێگایە کورتترین و نزیکترین ڕێیە لەچاو ئەوانیتردا، چونکە تەنها چوار هەنگاوە. ئنجا ئەگەر "کۆڵەواری" بەسەر نەفسدا زاڵ ببێت، ئەوا ڕاستەوخۆ تەسلیمی خواوەندی "بەتوانا"ی شکۆمەندی دەکات. بەڵام گەر لە ڕێگەی عیشقدا - کە گەیەنەرترین ڕێیە بۆ لای خوای گەورە - "عیشق" بەسەر نەفسدا زاڵ ببێت، ئەوا دەروونی مرۆڤ دەستەکانی لە داوێنی مەعشووقی مەجازی گیر دەکات و بەو جۆرە دەمێنێتەوە هەتا نەمانی ئەو مەعشووقەی دەبینێت، ئنجا دەگات بە خۆش ویستراوی ڕاستەقینە!

پاشان ئەم ڕێگایە لە هەموو ئەوانیتر بێوەیترە، چونکە "نەفس" لەم ڕێگایەدا دووچاری "شطحات" نابێت و لاف و گەزافی لە توانای خۆی بەرەوژوورتر لێ نادات، چونکە مرۆڤ لەم ڕێگایەدا جگە لە: کۆڵەواری و هەژاری و قسوور و ناتەواوی، هیچی تر لە نەفسی خۆیدا شك نابات، تا لە سنووری خۆی لابدات!

ئەم ڕێیە جادەیەکی گەورە و شەقامێکی گشتییە، چونکە مرۆڤ لەم ڕێیەدا ناچار نابێت بوونەوەران بخاتە "بەندیخانەوە" یان "ئیعدامیان" بکات، بە وێنەی ڕێڕەوانی ڕێگەی "وحدة الوجود"، کە بۆ مەبەستی گەیشتن بە دڵنیایی و حوزووری قەلبی، بوونەوەرانیان لە وەهمی خۆیاندا بە نەبوو(عدم) لە قەڵەم دا و، وتیان: "لا موجود الا هو".. یان بە وێنەی ڕێڕەوانی ڕێی "وحدة الشهود" کە بۆ مەبەستی بەهرەوەربوون و گەیشتنیان بەو دڵنیاییە، بوونەوەرانیان لە بەندیخانەی "بیرچوونەوە"دا بەند کرد و، وتیان: "لا مشهود الا هو"!

قورئانی پیرۆز - کە ئەم چوار ڕێیەی لێ وەرگیراوە - بە ئاشکرا لە ئیعدامکردنی بوونەوەران خۆش دەبێت و لە بەندیخانەش بەریان دەدات!

جا ئەم ڕێگایە - لەسەر ئەو ڕێبازەی قورئان - بەو چاوە دەڕوانێتە بوونەوەران کە: ملکەچ و گوێڕایەڵی بەدیهێنەری شکۆمەندیانن و، لە ڕێی ئەودا خزمەت دەکەن و، دەرخەری درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانن، دەڵێی ئاوێنەن ئەو درەوشانەوانە دەدەنەوە و دەریاندەخەن. واتە ئەم ڕێیە بوونەوەران بە واتای "حەرفی" دەبینێت و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و، دووریان دەخاتەوە لەوەی کە خاوەنی واتای "ئیسمی" بن و هەر بۆ خۆیان خرابنە خزمەت و گوێڕایەڵ کرابن.

بەم چەشنە، مرۆڤ لە بێئاگایی(الغفلة) ڕزگاری دەبێت و، لەسەر ڕێبازەکەی قورئانی پیرۆز بە "حوزووری بەردەوام و هەمیشەیی" دەگات و پێی بەهرەوەر دەبێت. ئەو کاتەش لە هەموو شتێکدا ڕێگایەك دەبینێت کە بە خوای گەورەی دەگەیەنێت.

**پوختەی ئەم قسانە:**

ئەم ڕێگایە بە "واتای ئیسمی" ناڕوانێتە بوونەوەران، واتە بەو ڕوانینە بۆیان ناڕوانێت کە لە خۆیاندا و بۆ خۆیان خرابنە کار و گوێڕایەڵ کرابن. بەڵکو ئەم بۆڕوانینەیان لێ دادەماڵێت و، ئەرك و فەرمانبەریی "ملکەچ بوونیان بۆ خوای گەورە" دەخاتە ئەستۆ.

# وتەی بیست و حەوتەم

## پەیامی ئیجتیهاد

**(نزیکەی پێنج ساڵ، یان زیاتر پێش ئێستا باسێکم لە بارەی ئیجتیهادەوە لە نامیلکەیەکی عەرەبیدا[1] نووسی. وا ئێستاش لەسەر داواکاری و خواستی دوو برای ئازیز و، بۆ مەبەستی ڕێنمایی‌کردنی ئەوانەی لەم مەسەلەیەدا سنووری خۆیان نازانن، تاکو هەست بکەن کە لە چ سنوورێکدا دەبێت بووەستن، ئەم وتەیەم نووسی).**

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿ولَوْ رَدُّوهُ إِلى الرَّسُولِ وَإِلى أُوْلِي الأمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِيْنَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ﴾ (النساء:٨٣)

دەرگای ئیجتیهاد هەمیشە کراوە و لەسەرپشتە، بەڵام لەم کات و سەردەمەی ئێمەدا شەش ڕێگر هەن، ڕێ لە چوونەژوورەوە دەگرن:

❑ **یەکەمیان:**

هەروەك لە کاتی ڕەشەبا و گێژەڵووکەی توندوتیژی زستاندا هەموو دەرگا و پەنجەرە و کەلەبەرێك دەگیرێن و دادەخرێن و، کردنەوەی دەرگای تر کارێکی ڕاست و ژیرانە نییە..

هەروەك لە کاتی هێرش هێنانی لافاودا، بۆ مەبەستی تازەکردنەوە و چاککردنەوەی دیوار و بەربەستەکان، کون و کەلەبەر و دەرگای ئەو دیوار و بەربەستانە ناکرێنەوە، چونکە ئەم کارە دەبێتە هۆی تیاچوون و ئەنجامەکەی ناهەموار دەبێت..

هەر بەم جۆرەش، کردنەوەی چەند دەرگایەکی نوێ بە ناوی ئیجتیهادەوە لە کۆشکی بەرزی ئیسلامدا، یان کون کردنی دیوارەکانی ئەو کۆشکە، کە ئەمەش ڕێگا بۆ چوونە ژوورەوەی وێرانکاران ئاسان دەکات، ئەم کارە لە ڕاستیدا تاوانە بەرامبەر بە ئایینی ئیسلام.

---

(١) ئەو نامیلکە عەرەبییە ناوی: "حُباب من عُمان القرآن الكريم"ە و، لە کتێبی: "المثنوي العربـــي النوري"دایە. (وەرگێڕ)

بە تایبەت لە کاتی زۆربوونی خراپکاری و، هێرش هێنان و دەستەڵات پەیداکردنی ڕەفتار و نەریتە بیانی‌یەکان و، پەرەسەندنی بیدعەت و، پاڵنان و کاولکاری‌یەکانی گومڕایی‌دا.

❑ **دووهەمیان:**

ئەو شتانەی پێیان دەوترێت: "ما عُلِمَ من الدين بالضرورة" کە بە "قەتعی" و جۆرێکی وا چەسپاون هەرگیز ناگۆڕرێن، ئەمانە ئیجتیهادیان تێدا ناکرێت و، لە حوکمی قووت و خۆراکدان. هەموو ئەمانە لەم سەردەمەدا پشت گوێ خراون و خەریکە لەتوپەت دەبن. کەواتە کارێکی تابلێی پێویستە کە هەموان هەوڵ و کۆششی بێ وچان بۆ زیندووکردنەوە و ئەنجامدانی ئەو لایەنە زەرووری‌یانە بدەن، چونکە لایەنە "نەزەری"یەکانی ئیسلام، بە بۆنەی بیر و ئیجتیهادی بێ گەرد و خاوێنی زانا پیاوچاکەکانی پێشینەوە فراوان و دەوڵەمەند بوون، بە چەشنێك کە بەشی هەموو سەردەمێك بکات و لەگەڵ هەموو چەرخێکدا بگونجێ. لەبەر ئەوە، وازهێنان لەو ئیجتیهادانەی کە بە نیازێکی پاك و بێ گەرد کراون و، دەست کردن بە ئیجتیهادی نوێ لە پێناوی شوێنکەوتنی "ئارەزووی نەفس"دا، بە خیانەت و بیدعەتێکی تازە دادەنرێت.

❑ **سێ‌هەمیان:**

هەروەك هەندێ کەرەسە و شتومەك، هەریەکەیان بەپێی وەرزی خۆی، لە بازاڕدا برەوی دەبێت و بایەخی پێ دەدرێت، بازاڕی ژیانی کۆمەڵایەتی و شارستانێتیی مرۆڤیش لە جیهاندا بە هەمان جۆرە.. دەبینیت جۆرە شتومەك و کەرەسەیەك لە چەرخێکی تایبەتی‌دا ڕەواجی دەبێت و برەوی پێ‌دەدرێت و سەرنج و بیری خەڵکیان بۆ لا ڕادەکێشرێت و پێش‌چاو دەخرێن و، خەڵکیش ئارەزوومەندیان دەبن..

بۆ نموونە: ئەو شتەی کە لەم سەردەمەی ئێمەدا سەرنجی خەڵکی بۆ لا ڕادەکێشرێت، خۆ خەریك کردنە بە کاروبار و ڕووداوەکانی سیاسەت و.. خۆش ڕابواردن و دابین کردنی ژیانی دنیا و، خەم و خەفەت‌خواردن تەنها بۆ ئەم دنیایە و.. بڵاوکردنەوە و برەوپێدانی بیروڕا ماددی‌یەکان..

بەڵام لە چەرخ و سەردەمی زانایانی پیاوچاکی پێشیندا، ئەو کەرەسە و شتومەکەی گرانبەها بووە و بایەخ و برەوی پێ‌دراوە و لە بازاڕی زەمانی ئەواندا سەرنجی بۆ لا ڕاکێشراوە، بریتی بووە لە: ڕەزامەندیی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و، سنوور نەشکاندنی فەرمانەکانی و، دەرهێنانی ئەمر و نەهی‌یەکانی لە گوفتارە مەزنەکەی‌دا و، هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتانەی کە هۆی گەیشتنن بەو بەختەوەری‌یە هەمیشەیی‌یەی کە قورئانی پیرۆز و ڕووناکیی درەخشانی سوننەتی نەبەوی دەرگاکانیان بۆ خستبووە

سەرپشت.. بە جۆرێکی وا کە لەو سەردەمانەدا "زەین" و "دڵ" و "گیان"ی ئەوان، بە هەموو هێزێکیانەوە، بۆ: زانینـی ئـەو شتانەی مایـەی ڕەزامـەندیی خـوای گـەورەن و، بـۆ: فـێربوونی ئامانجەکانی خواوەند لە گوفتارەکانی‌دا، ئاراستە کرابوون. بە ڕادەیەك کە هـەموو ڕوویـەکی ژیـان و، حاڵەتـە جۆراوجۆرەکـان و، پـەیوەندی و، گفتوگۆکـانی نێوانیـان هـەموویان ڕووەو ڕەزامەندیی خواوەندی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی ئاراستە کرابوون..

لەبەر ئەوە، هەر شت و کاروبار و ڕووداوێك لە ژیانێکی ئـاوادا لـە ژینگـە و دەوروبـەری هەر خاوەن توانا و لێهاتنێك ڕوویدات، کە ژیانێکە هەموو لایەنێکی بـەپێی ڕەزامـەندیی خـوا بەڕێوە دەڕوات، بێ ئەوەی ئەو خاوەن توانا و لێهاتنـە بـە خـۆی بزانێـت، هـەموو ئەوانـەی بـۆ دەبێـت بـە دەرس و پـەند و، وەك بلێـی دڵ و سروشتەکەی دەرس و ڕێنمـایی لـە دەوروبـەر و، سـوود لـە هـەموو بـارودۆخ و ڕووداوێـك وەردەگـرن و، هـەموو شـتێك دەوری مامۆسـتا و ڕابەری بۆ ببینێت، ئاوا سروشتی ئەو مرۆڤە فێر و ڕێنمایی دەکات، بـە ڕادەیـەك کـە زیرەکیـی ئەو کەسە، بێ ئەوەش ئـاگری "ئیکتیسـاب"ی بەرکـەوتبێت، لـە ڕوونـاکی‌دا دەدرەوشێتەوە. ئیتر ئەگەر کەسێکی وا ئامادە، لە کۆمەڵێکی ئاوادا و، لە کاتی خۆی‌دا، دەست بـە ئیجتیـهاد بکات، ئەوا ئەو ئامادەیی و لێهاتنەی کە لـەو کەسـەدا هەیـە، یـەکێك لـە نهێنی‌یـەکانی: (نـور علـی نـور)ی دەسـت دەکـەوێت و، بە زوویی و لـە ماوەیـەکی یـەکجار کورتـدا دەبێـت بـە موجتەهید.

بەڵام لەم چەرخ و سەردەمەی ئێمەدا:

خۆسەپاندنی شارستانێتیی ئەوروپا و.. زاڵ بوونی بیر و فەلسەفەی ماددی و.. ئاڵۆزبوونی داخوازی‌یـەکانی ژیـانی ڕۆژانـە، دەبـن بـەهۆی شـپرزەیی بـیری ئـادەمیزاد و سـەرگەردانیی دڵانیان و، پەرتەوازەبوونی هیممەتیان و، بەش‌بەش بوونی ئەو شتانەی کە مایەی بایەخ پێدانـی ئەون. بە ڕادەیەك کە کاروبارە مەعنەوی‌یەکان لە زەین و بیری خەڵکی‌دا نامۆ بوون.

لەبـەر ئـەوە، ئەگـەر لـەمڕۆدا کەسـێك ببێـت لـە زیرەکـی‌دا وەکـو (سـوفیانی کـوڕی عویەینە)[1] وابێت، کە لە تەمەنی چوار ساڵی‌دا هەموو قورئانی پیرۆزی لەبـەر کـردووە و، لـە

(١) سوفیانی کوڕی عویەینـە لـە سـاڵی ١٠٧ی کۆچی لـە کووفـە لـە دایـك بـووە و لـە سـاڵی ١٩٨ی کۆچی‌دا لـە مەککە کۆچی دوایـی کـردووە. پێشـەوا و زانـا و جێی‌بڕوا و قسـەڕەوا و زاهیـد و ئـەهلی وەرع بـووە و، زانایـان بـە یەکدەنگی ڕیوایەتی لـێ دەکەن و ڕیوایەتەکانیشـی بـە صـەحیح دادەنێن، حـەفتا جـار حـەجی کـردووە، بە خزمـەتی هەشتا کەس زیـاتر لـە (تـابعین) گەیشـتووە. حـەدیثی لـەم زانایانـەوە ڕیوایـەت کـردووە: زوهـری و، سـەبیعی و، ابـن المنکدر و، ابو الزناد و، عاصم المقري و، اعمـش و، عبدالملـك و زانایـانی تـری غـەیری ئـەمانیش لـە گـەورە پیـاوانی تابعین. ئەم زانایانەش حەدیسیان لـێ ڕیوایەت کردووە: ئیمامی شافیعی و، شـوعبە و، محەممـەدی کـوڕی ئیسـحاق و،

کۆڕی دەرسی زانایاندا دانیشتووە و بەشداریی کردووە، ئەوا ئەو کەسەی کە ئەمڕۆ لە زیرەکیدا وەکو ئەو وایە، پێویستی بە (دە) هێندەی ئەو شتانە دەبێت کە ئەو کاتە سوفیانی کوڕی عویەینەیان گەیاندبووە پلەی ئیجتیهاد! واتە: ئەوەی کە بۆ ئیجتیهادکردنی سوفیانی کوڕی عویەینە لە ماوەی دە ساڵدا ڕەخسا، ئەوا بە سەد ساڵ ئنجا بۆ ئەو کەسە دەڕەخسێت کە لەم سەردەمەی ئێمەدا لە زیرەکیدا وەکو ئەو وایە!

چونکە سەرەتای سروشتیی فێربوونی سوفیان بۆ ئیجتیهادکردن لە تەمەنی "تەمیز"ەوە سەر هەڵدەدات و، ئنجا وردە وردە ئامادەیی و لێهاتنی بۆ ئیجتیهاد، بە وێنەی ئامادەیی گۆگرد بۆ ئاگر، دەست پێدەکات.. بەڵام ئەو کەسەی کە ئەمڕۆ لە زیرەکیدا وەکو ئەو وایە، بیری لە زۆنگاوی فەلسەفەی ماددیدا نوقمبووە و، عەقڵی پەرتەوازەی ڕووداوە سیاسییەکانە و، لە بەردەم داخوازییەکانی ژیان و گوزەرانی دنیادا سەرسام و سەرگەردان بووە و، توانا و ئامادەیی و لێهاتنەکانیشی لە ئیجتیهاد دوور کەوتوونەتەوە..

بێگومان لێهاتوویی و توانای ئەم چەشنە مرۆڤە، بە ئەندازەی ڕۆچوون و وردەکاریی لە زانستە نوێیەکانی سەر زەویدا، بەو ڕادەیە لە توانا و پلەی ئیجتیهاد کردن دوور کەوتووەتەوە. لەبەر ئەوە، بۆی نییە بڵێت: (خۆ من وەکو سوفیان زیرەکم، ئیتر بۆچی ناتوانم وەك ئەو بگەمە پلەی ئیجتیهاد)؟

بەڵێ، بۆی نییە ئەمە بڵێت، هەروەك هەرگیز پێیشی ناگاتەوە!

❑ **چوارەمیان:**

ئەگەر مەیلی نەش و نما کردنی هەر جەستە و لەشێك لەناو خودی ئەو لەشەوە پەیدا ببێت، ئەوا دیارە مەیلێکی ڕەسەن و تەواوە. بەڵام ئەگەر ئەم مەیلە هی دەرەوەی لەشەکە بوو، ئەوا هۆیەکە بۆ لەت بوونی پێستی ئەو لەشە. واتە هۆکارێکە بۆ تێکدان، نەك فراوانبوون و گەشە کردن!

بە هەمان جۆر، ئەگەر ویستی ئیجتیهاد و ئارەزووی فراوانکردنی ئایین لە لای ئەو کەسانەوە بێت کە لە خولگەی ئیسلامدا دەخولێنەوە و، لە دەرگای تەقوا و وەرعی تەواوەتی و ڕاستەقینەوە و لە ڕێگای ئەنجامدانی "زەروورییاتی ئایینی"یەوە بێت، ئەوا بەڵگەی تەواوییە و هەوڵدانە بۆ تەواوکاری. باشترین شایەت لەسەر ئەمە پیاوچاکانی پێشینمانن.

---

ابن جریج و، ابن بکار و، موصعەبی مامی و، صەنعانی و، یەحیای کوڕی ئەکثەم و، زانایانی زۆری تریش، خوا لە هەموویان ڕازی بێت. (وەرگێڕ – بە کورتی لە کتێبی: "وفیات الاعیان"ی "ابن خلکان"ەوە – ج٢ /ص٣٩١ – ٣٩٣).

به‌ڵام ئه‌گه‌ر سه‌ربه‌رزكردنه‌وه بۆ ئیجتیهاد و ئاره‌زووی فراوانكردنی ئایین، له لایه‌نی ئه‌و كه‌سانه‌وه بێت كه وازیان له (زه‌رووریاتی ئایینی) هێناوه و، فه‌زڵی ژیانی دنیایان به‌سه‌ر دواڕۆژدا داوه و، به فه‌لسه‌فه‌ی ماددی چه‌په‌ڵ بوون، ئه‌وا ئه‌م جۆره ئیجتیهاده، هۆكارێكه بۆ ڕووخاندن و له‌ناوبردنی ئیسلام و، داماڵینی ئیسلام له ئه‌ستۆی موسڵمانان.

❑ **پێنجه‌میان:**

سێ خاڵی سه‌رنج ڕاكێش هه‌ن وا له ئیجتیهادی ئه‌م چه‌رخه‌ی ئێمه ده‌كه‌ن كه په‌یوه‌ندیی به زه‌وی‌یه‌وه بێت و گیانه ئاسمانی‌یه‌كه‌ی لێ داده‌ماڵن، له كاتێكدا كه شه‌ریعه‌ت ئاسمانی‌یه و، ئیجتیهادیش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی حوكمه نهێنی‌یه‌كانی شه‌ریعه‌ت ده‌رده‌هێنێت، ئه‌وا ده‌بێت ئه‌ویش ئاسمانی بێت.

(سێ خاڵه‌كه‌ش ئه‌مانه‌ن):

*یه‌كه‌میان:* "عیلله‌ت" و "حیكمه‌ت"ی هه‌ر حوكمێكی شه‌رعی دوو شتی له‌یه‌ك جیاوازن و نابن به یه‌ك. حیكمه‌ت و مه‌سڵه‌حه‌ت هۆی ته‌رجیحدانی حوكمه‌كه‌ن، نه‌ك هۆ و خولگه بن بۆ په‌یدابوونی ئه‌و حوكمه. به‌ڵام "عیلله‌ت" خولگه‌ی په‌یدابوونی حوكمه‌كه‌یه.

با ئه‌مه به نموونه‌یه‌ك ڕوون بكه‌ینه‌وه:

له سه‌فه‌ردا نوێژه چوار ڕكاتی‌یه‌كان كورت ده‌كرێنه‌وه و له بریی چوار ڕكات دوو ڕكات ده‌كرێت.

ئه‌م ڕوخسه‌ته شه‌رعی‌یه عیلله‌ته‌كه‌ی بریتی‌یه له (سه‌فه‌ر) به‌ڵام حیكمه‌ته‌كه‌ی ئه‌و (مه‌شه‌ققه‌ت)ه‌یه كه (له‌وانه‌یه) له سه‌فه‌ردا ببێت. جا ئه‌گه‌ر هه‌ر كاتێك (سه‌فه‌ر) بوو، ئیتر (مه‌شه‌ققه‌ت) هه‌بوو یان نه‌بوو، ئه‌وا نوێژه‌كه كورت ده‌كرێته‌وه. چونكه عیلله‌ته‌كه كه سه‌فه‌ره هاتووه‌ته‌دی. به‌ڵام ئه‌گه‌ر (مه‌شه‌ققه‌ت)ی چه‌ندین ئه‌وه‌نده‌ی هی سه‌فه‌ر له گۆڕێدا ببێت، نوێژی پێ كورت ناكرێته‌وه و نابێت به عیلله‌تی كورتكردنه‌وه‌ی نوێژ.

ڕوانینی ئیجتیهادی ئه‌م سه‌رده‌مه به پێچه‌وانه‌ی ئه‌م ڕاستی‌یه‌وه‌یه، له بریی عیلله‌تی حوكم ده‌ڕوانێته مه‌سڵه‌حه‌ت و حیكمه‌ت و، له ڕۆشنایی ئه‌مه‌دا حوكمی خۆی ده‌رده‌كات. بێ گومان ئیجتیهادی وه‌ك ئه‌مه، ئیجتیهادێكه به زه‌وی‌یه‌وه به‌نده و، په‌یوه‌ندیی به ئاسمانه‌وه نی‌یه.

*دووه‌هه‌م:* ڕوانینی ئه‌م سه‌رده‌مه به تایبه‌تی و ڕاسته‌وخۆ ئاراسته‌ی به‌ده‌ستهێنان و دابین كردنی به‌خته‌وه‌ریی دنیا كراوه و، ڕووی ئه‌حكامه‌كانیش به‌ره‌و ئه‌و ڕووه وه‌رچه‌رخێنراوه! له كاتێكدا كه مه‌به‌ستی ڕاسته‌وخۆ و سه‌ره‌كیی شه‌ریعه‌ت له پێش هه‌موو شتێك و له پله‌ی یه‌كه‌مدا ئاراسته‌ی دابین كردنی به‌خته‌وه‌ریی دواڕۆژ كراوه و، ئنجا له پله‌ی دووهه‌مدا و بۆ

ئەوەی ئەم دنیا بکات بە هۆکارێك بۆ بەختەوەریی ئەودنیا، دەروانێتە بەختەوەریی ژیانی ئەم دنیایە. واتە ڕووکاری ئیجتیهادی ئەم سەردەمە لە "گیان" و "ئامانجەکان"ی شەریعەتەوە نامۆ و دوورە و، ناتوانێت بە ناوی شەریعەتەوە ئیجتیهاد بکات.

*سێ‌هەم:* ئەو قاعیدە شەرعی‌یەی کە دەڵێت: "الضرورات تُبیح المحظورات" واتە: "پێویستی" کارێك دەکات کە شتانی حەرام دەهێنێتە پلەی حەڵاڵەوە، قاعیدەیەکی گشتی و هەمەکی نی‌یە. چونکە ئەگەر "پێویستی" لە ڕێگای حەرامەوە پەیدا بوو‌بێت، ئەوا نابێت بەهۆی حەڵاڵ بوونی شتی حەرام و، ئەو پێویستی‌یەی لە ئەنجامی کاری هەڵە و خراپی مرۆڤەوە دروست بووە، هەرگیز نابێت بە بیانوو و هۆیەك بۆ حەڵاڵ کردنی حەرام و بە یەکێك لە خولگەکانی ئەو ئەحکامانە دانانرێت کە ڕوخسەتیان تێدا ڕەچاو کراوە.

بۆ نموونە: ئەگەر کەسێك بە ڕەزامەندی و ویستی خراپی خۆی بڕوات خۆی مەست بکات، ئەوا بە لای زانایانی شەرعەوە بەرپرسی هەموو هەڵسوکەوتێکی خۆیەتی. واتە مەستی‌یەکەی نابێت بە عوزر و بەهانە بۆ هیچ هەڵسوکەوتێکی. ئەگەر ژنەکەی تەڵاق بدات، تەڵاقی دەکەوێت و.. هەر تاوانێکیش بکات، سزا دەدرێت! بەڵام ئەگەر مەست‌بوونەکەی بە بێ هیچ ویست و دەستەڵاتێکی خۆی بوو‌بێت، ئەوا نە تەڵاقەکەی دەکەوێت و، نە لەسەر تاوانەکەیشی سزا دەدرێت. بۆ نموونە: مەی‌خۆرێکی هەمیشە گیرۆدەی مەی(مدمن) بۆی نی‌یە بڵێت: (من تازە گرفتار بووم، کەواتە مەی بۆ من پێویستە و سەبارەت بە من حەڵاڵە). نەخێر بۆی نی‌یە ئەمە بڵێت، با سەبارەت بەویشەوە گەیشتبێتە ڕادەی پێویستی.

هەر لەم ڕوانگەیەوە زۆر شت لەم سەردەمەدا هەن کە خەڵکیان پێوە گیرۆدە بووە و بۆ ئەوان وەك پێویستی لێ هاتووە، بە ڕادەیەك شێوەی گیرۆدەیی‌یەکی گشتی (البلوی العامة)ی وەرگرتووە. جا ئەم جۆرە شتانەی کە ئێستا بە "پێویستی" دادەنرێن، هەرگیز نابن بە بەهانە بۆ ئەحکامەکانی ڕوخسەت و، شتی حەرامیان لە پێناودا حەڵاڵ ناکرێت، چونکە لە ئەنجامی ویست و دەستەڵاتی خراپ و هەڵەی مرۆڤ و، ئارەزووی نامەشرووع و، مامەڵەی حەرامەوە پەیدا بوون.

جا مادەم ئەوانەی کە لەم زەمانەدا ئیجتیهاد دەکەن، ئەم "پێویستی"یانەیان کردووە بە خولگەی حوکمە شەرعی‌یەکان، ئەوا ئیجتیهادەکانیان ئیجتیهادێکی سەر بە زەوی و، شوێنکەوتەی ئارەزووە و، ئاوێتەی فەلسەفەی ماددی‌یە! کەواتە ئیجتیهادێکی ئاسمانی نی‌یە و، بە هیچ جۆرێکیش دروست نی‌یە ناوی: (ئیجتیهادی شەرعی)یان لێ بنرێت. چونکە

هەر دەستكاری كردنێك لە ئەحكامەكانی بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی‌دا و، هەر دەست تێوەردانێك لە پەرستشی بەندەكانی‌دا، بە بێ هیچ ئیزن و ڕوخسەتێكی مەعنەوی، شتێكی وەرنەگیراوە و بەسەر خاوەنەكەی‌دا دەدرێتەوە!

با نموونەیەك بۆ ئەمە بهێنینەوە:

هەندێ كەس لە بێ‌ئاگایان وایان پێ باشە كە وتاری هەینی و درووشمە ئیسلامی‌یەكانی تری وەك ئەو، لە بریی زمانی عەرەبی، هەموو نەتەوەیەك بە زمانی خۆی ئەنجامی بدات[1]. ئەو بێ‌ئاگایانە دوو هۆ بۆ ئەم كارە دەكەن بە بیانوو:

یەكەم: بۆ ئەوەی عامەی موسڵمانان لە ڕووداوە سیاسی‌یەكان تێ‌بگەن! كە دەشزانین ئەوەندە درۆ و دەلەسە و فرتوفێڵ لەمڕۆدا تێكەڵ بە سیاسەت بووە، كە گەیاندوویانەتە ئەوەی لە حوكمی وەسوەسەی شەیتاندا بێت! لە كاتێكدا كە مینبەر شوێنی ڕاگەیاندنی سرووش(وەحی)ی خوای گەورەیە و، زۆر لەوە بەرز و پایەدارترە وەسوەسەی شەیتانی بۆ سەربكەوێت.

دووهەم: وتاری هەینی بۆ تێگەیشتنە لەو ئامۆژگاری‌یانەی كە هەندێ سوورەتی قورئان خەڵكیان بۆ ڕێنمایی دەكەن.

بەڵێ، ئەگەر ئەو شتانەی كە لە شەرعدا موسەللەمن و، ئەو ئەحكامانەش كە لە ئاییندا بە زەرووڕەت دانراون، زۆربەی موسڵمانان بیانزانن و پەیڕەوی‌یان لێ بكەن، ئەوا ئەو كاتە وتار خوێندنەوە بەو زمانەی دەیزانن شتێكی جوان دەبوو، هەروەك وەرگێڕانی چەند سوورەتێكیش لە قورئانی پیرۆز - ئەگەر مومكین بێت -[2] هۆكار و بواری بۆ دەڕەخسا تاكو دوای زانینی ئەو زەرووری‌یاتانە، شتە شەرعی‌یە نەزەری‌یەكان و مەسەلە وردەكان و، ئامۆژگاری‌یە شارراوەكانیش فێربن و بیانزانن.

بەڵام خۆ لەم سەردەم و كاتەی ئێمەدا، ئەحكامە ئاشكرا و زانراوەكانی وەك: واجب بوونی نوێژ و زەكات و ڕۆژوو، هەروەها حەرام بوونی قەتڵ و داوێن پیسی و مەی، پشت گوێ خراون و، عامەی موسڵمانان چەندە پێویستیان بە زانینی ئەم واجب بوون و

---

(١) مەبەست وتنی هەموو وتارەكەیە تەنها بە زمانەكانی تر و بەكارنەهێنانی زمانی عەرەبی‌یە بە هیچ جۆرێك. وەك ئەوەی كە لە توركیا لە ناوەڕاستی ساڵەكانی بیستەوە تا ساڵی ١٩٥٠ز لە بانگ و قامەتی نوێژدا دەكرا. بەڵام لەم بەروارەوە، ئەم درووشمانە هێنرانەوە سەر شێوە شەرعی‌یەكانی خۆیان. (وەرگێڕ)

(٢) لە وتەی بیست و پێنجەمدا كە تایبەتە بە ئیعجازی قورئانەوە چەسپاندمان كە هەرگیز وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز بە چەشنێكی ڕاستەقینە بۆ هیچ زمانێكی تر لە توانادا نی‌یە. (دانەر)

حەرام بوونەیە، زیاتر پێویستیان بە هێنانەدیی ئەو ئەحکامانە و پەیڕەوی کردنیانە لـە ژیانیـاندا. ئەمەش بەوە دێتەدی کە هەردەم یـاد بخرێنـەوە و بـۆ کـردەوەی چـاك هـانبدرێن و، هیممـەت و غیرەتی ئیسلام لـە دەمارەکانیاندا تیژ بکرێنەوە و بهەژێنرێن و، هەسـتی ئیمانی‌یـان بزوێـنرێت، تاکو بۆ شوێنکەوتن و پەیڕەوی کردنی ئەو ئەحکامە پاك و خاوێنانە ڕاپەڕن.

موسڵمانی عەوام - چەندەش نەزان بێت - ئـەم پوختـە واتایـە لـە قورئـانی پیرۆز و وتـاری عەرەبی تێ‌دەگـات و، لـە قووڵایـی دەروونـی خـۆی‌دا دەزانێـت کـە وتـارخوێن و، خوێنـەری قورئانی پیرۆز، پایـەکانی ئیمـان و بناغـە پێویسـت و زانراوەکـانی ئـایین یـادی ئـەم و کەسـانی دیکەش دەخاتەوە و، بەمەش دڵی لە شەوقی ئـەنجامدان و پـەیڕەوی کردنـی ئـەو ئەحکامانـە پڕ دەبێت.

خۆزگا دەمزانی لە هەموو گەردووندا چ تـەعبیرێك هەیـە بتوانێـت لـە بەرامبـەر ئیعجـازی قەشـەنگی قورئـانی پـیرۆزی پەیوەسـتەی عەرشـی مـەزنی پـەروەردگارەوە لەسـەر پـێ ڕابووەستێت و.. چ تەرغیب و تەرهیب و، چ یادخستنەوە و ڕوونکردنەوەیەك دەتوانێت لـەو گەورەتر بێت؟!

❑ **شەشەمیان:**

نزیکیـی سـەردەمی موجتـەهیدە گـەورەکان لـە سـەردەمی پیاوچاکـە پێشـینەکانەوە، کـە بریتی‌یە لە چەرخی هاوەڵە بەڕێزەکان و لە ڕاستی‌دا چەرخ و سەردەمی نوور و ڕاستی‌یە، ئـەم نزیکی‌یە، ئەوەی بـۆ ئاسـان و مەیسـەر کردبوون کـە ڕووناکی‌یە بێ‌گـەردەکان لـە نزیکـترین سەرچاوەی خۆیانەوە وەربگرن. بەمەش توانی‌یان ئیجتیهادە بێ‌گـەردەکانیان بـە پـاکی ئـەنجام بدەن.

بەڵام موجتەهیدەکانی سەردەمی نوێ، لە ماوەیەکی تـابلێی دوورەوە و لـە پشـتی چـەندین پـەردەی زۆر و زەبـەندەوە بـۆ کتێبی "حەقیقـەت" دەڕوانن، بـە ڕادەیـەك کـە زۆر بـە ئەسـتەم ڕوونترین پیتی تێدا بەدی دەکەن!

**ئەگەر دەڵێیت:**

خولـگەی ئیجتیـهادەکان و سـەرچاوەی حوکمـە شـەرعی‌یەکان بریتی‌یە لـە ڕاستگۆیی و دادگـەریی هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ بـە چەشـنێ کـە سـەرجەمی نەتـەوەی ئیسـلام لەسـەر ڕاستگۆیی و دادگەریی ئەوان یەکیان گرتووە.. بەڵام خۆ ئەوانیش وەك ئێمە مرۆڤن و لە هەڵە بەدەر نین؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

هـاوەڵان - خوایـان لــێ ڕازی بێــت - پێشــەوا و شــەیدایانی حەقیقــەتن و، تامــەزرۆ و ئارەزوومـەندی ڕاسـتی و دادگـەرین. لـە سـەردەمی ئـەواندا خراپـی و ناشـیرینیی "درۆ" و، چاكی و جوانییی "ڕاستی" بە ڕوونی دەركەوتبوو. بە ڕادەیەك كـە مـاوەی نێـوان "ڕاستی" و "درۆ" بە ئەندازەی دووریی نێوان زەوی و ئاسمان و عەرش و فەرش، فراوان بوو!! چونكە ئەو جیاوازیـیە گەورەیـەی نێـوان پێغەمبـەری مـەزن ﷺ (كـە لەسـەر چڵەپۆپـەی هـەرە بـەرزی پلەكانی ڕاستیدا ڕاوەسـتاوە) و، موسـەیلەمەی درۆزن (كـە لـە نزمـترین پلـەكانی درۆزنـیدا بوو) بۆ ئەوان ڕوون بووبووەوە.

ئەو شتەی كە موسـەیلەمەی دابـەزاندە پلـە نزمـەكان (درۆ) بـوو و، ئـەوەش كـە حـەزرەتی محەممەدی ئەمینی ﷺ گەیاندە ئەو پلە بەرزانە (ڕاستی) و ئیستیقامەت بوو.

لەبـەر ئـەوە، هاوەڵـە بـەڕێزەكان - خوایـان لـێ ڕازی بێـت - كـە خـاوەنی هیممـەت و ڕەوشتی بەرزن و، بە بۆنەی ڕووناكیی هاوەڵێتیی خۆری نبووەتەوە ڕوونـاك بووبوونـەوە، بێ هیچ گومانێك ئەم هاوەڵانە - وەك چەسپاوە - هـەردەم دوورە پـەرێزییان لـەو درۆ و دەلەسـە بێز لێكراوەی كەرەسەكەی موسەیلەمەی درۆزن كردووە، كە ئەوەندە كەرەسەیەكی چەپـەڵ بووە زەلیلی و ڕسـوایی بەرهـەم دەهێنـا. هـەروەها وەك چۆن لـە كوفر هـەڵدەهاتن و توخنـی نـەدەكـەوتن، بە هـەمان جۆر توخنـی درۆیش نەدەكـەوتن كـە شــتێكـە هـاوشـان و هاوتـای كـوفرە و، بە هەموو هێز و لێبڕان و توانایەكیانەوە هەوڵی بێوچانیان بۆ دەستكەوتنی حەق و ڕاسـتی و ئیستیقامەت بوو، تا ئـەو ڕادەیـەی كـە شـەیدای بووبـوون. بـە تایبـەت لـە ڕیوایـەت كـردن و ڕاگەیاندنی ئەحكامەكانی شـەرعدا، ئەو ئەحكامـە جوانانـەی كـە شـایانی شـانازی پێوەكردنن و، هۆكارن بۆ پێشكەوتن و سەركەوتن بەرەو كەماڵ و، پەیوەستن بـە مـەزنیی ئـەو پێغەمبەرەوە ﷺ كە ژیانی مرۆڤایەتی بە تیشكی ئەو ڕووناك بووەتەوە.

بـەڵام ئێسـتا مـاوەی نێـوان (درۆ) و (ڕاسـتی) ئـەوەندە تەسـك و كـورت بووەتـەوە كـە لـە ئاست و بەرامبەری یەكتریدان، بەڵكو هاوشانی یەكن و، بازدان لە ڕاستییەوە بۆ درۆ تـابڵێی كارێكی ئاسانە. تەنانەت لە پڕوپاگەندە سیاسییەكاندا فەزڵی درۆ بەسەر ڕاستیدا دەدرێت!

ئەگـەر جوانـترین و ناشـیرینترین شـت لـە یـەك دوكـاندا و بـە هـەمان نــرخ و لــە تەنیشـتی یـەكترەوە بفرۆشـرێن، ئـەوا كڕیـاری مرواریـی گرانبـەهای (ڕاسـتی) نـابێت پشـت بـە قسـە و ناسراویی فرۆشیار ببەستێت، هەتا خۆی بە جوانی تەتەڵەی نەكات و لێكی نەداتەوە!!

# کۆتایی

بەپێی گۆڕانی کات و سەردەم، شەریعەتەکانیش دەگۆڕرێن. بەڵکو هەروەك ڕوویشیداوە، هەندێ جار لە یەك کات و سەردەمدا و بە گوێرەی نەتەوەکانی ئەو کاتە چەندین پێغەمبەر لە لایەن خواوە ڕەوانە کراون.

بەڵام دوای کۆتایی هێنان بە پێغەمبەرایەتی و ناردنی دواهەمین پێغەمبەر ﷺ پێویست بە شەریعەتی تر نەما. چونکە شەریعەتە مەزنەکەی ئەو پێغەمبەرە ﷺ سەروزیادی هەموو نەتەوەیەکە لە هەموو چەرخێکدا. لایەنە جوزئیيەکانی ئەو ئەحکامە فیقهیيانەش کە دەق (نص)یان لە بارەوە نییە و، بەپێی بارودۆخ داخوازی ئاڵوگۆڕن، ئەوا ئیجتیهادی زانایانی مەزهەبەکان ئەم کارەیان گرتووەتە ئەستۆ.

هەروەك بەرگ و پۆشاك بەپێی وەرزەکان و، دەرمان بەپێی پێویستیی نەخۆش و بیماران دەگۆڕرێن، شەریعەتەکانیش بە هەمان جۆرن، بەپێی سەردەمەکان دەگۆڕرێن و ئەحکامەکانیش بە گوێرەی ئامادەیی سروشتیی نەتەوەکان دەبن. چونکە ئەحکامە فەرعیيەکانی شەرع شوێنکەوتەی حاڵەتەکانی مرۆڤن و، لەگەڵ ئەو حاڵەتانەدا گونجاون و دەرمانی دەردەکانیانن.

ئەوەبوو چینەکانی مرۆڤ لە سەردەمی پێغەمبەرە پێشینەکاندا - سڵاوی خوایان لەسەر بێت - لە یەکتر دوور بوون و، وشکی و توندوتیژیش لە خوو ڕەوشتیاندا هەبوو و، لە بیرکردنەوەیاندا زیاتر لە دەشتەکێتیيەوە نزیکتر بوون. لەبەر ئەوە، شەریعەتەکانی ئەو سەردەمانە جیاجیا و، لەگەڵ بارودۆخیاندا شیاو بوون. تەنانەت هەندێ جار ڕووی داوە کە چەندین پێغەمبەر - درووديان لەسەر بێت - لە یەك ناوچە و یەك سەردەمدا چەند شەریعەتێکی جیاجیایان لەگەڵ خۆیاندا بۆ خەڵکی ئەو کاتە هێناوە.

بەڵام بە هاتنی دواهەمین پێغەمبەر، کە پێغەمبەری ئاخر زەمانە ﷺ مرۆڤایەتی کامڵ بوو، وەك بڵێی قۆناغی سەرەتایی و ئنجا ناوەندیی بڕیوە و، بەرەو خوێندنی باڵا ڕۆشتووە و، ئێستا شایانی ئەوەیە کە یەك وانە بخوێنێت و گوێ بۆ یەك مامۆستا ڕابگرێت و پەیڕەویی یەك شەریعەت و ڕێباز بکات. ئیتر دوای ئەمە، با ئیختیلافەکانیش زۆر بن، مرۆڤ پێویستیی بە شەریعەت و مامۆستای زۆر نەما و، یەك شەریعەت و یەك مامۆستای بەسە.

بەڵام لەبەر ئەوەی سەرجەمی مرۆڤایەتی ناتوانن بگەنە یەك ئاست و لەسەر یەك ڕەوت لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بڕۆن، ئەوا مەزهەبە فیقهیيەکان لە (فروع)دا بە زۆری دروست بوون.

خۆ ئەگەر زۆربەی زۆر و ڕەهای مرۆڤایەتی بتوانن تەنها یەك ژیانی کۆمەڵایەتی بژین و لە یەك ئاستدا بن، ئەوا ئەو کاتە دەکرێت مەزهەبەکانیش یەك بگرن و ببن بە یەك.. بەڵام هەروەك حاڵەت و باری جیهان و سروشتی خەڵکی دەرفەت بەمە نادەن، ئەوا مەزهەبەکانیش ئەو یەکگرتنە بە خۆیانەوە نابینن!

ئەگەر دەڵێیت: خۆ (حەق) هەر یەکێکە، ئیتر چۆن ئەحکامە جیاوازەکانی هەر چوار مەزهەبەکە و مەزهەبی دوازدە ئیمامەکان هەموویان (حەق) دەبن؟

وەڵام: (ئاو) بەپێی چێژ و حاڵەتی جیاجیای نەخۆشەکان، پێنج حوکمی جیا جیا وەردەگرێت. ئەوەتا بۆ میزاجی نەخۆشێك باشە و بۆ ئەو دەرمانە، واتە لە ڕوانگەی پزیشکیی‌یەوە ئاو (واجب)ە بۆی.. لەوانەیە بۆ نەخۆشێکی تر زیانی ببێت و وەك ژەهر وابێت، کەواتە لە ڕوانگەی پزیشکیی‌یەوە بۆ ئەو (حەرام)ە.. لەوانەیە زیانێکی کەمتری بۆ نەخۆشێکی تر تێدا بێت، کەواتە بەپێی پزیشکی بۆ ئەم (مەکرووهە).. لەوانەیە بۆ نەخۆشێکی تر سوودی ببێت، بێ ئەوەی زیانیشی پێبگەیەنێت، کەواتە بەپێی پزیشکی بۆ ئەم (سوننەت)ە. لەوانەیە نە زیان و نە سوودی بۆ یەکێکی تر نەبێت، کەواتە بەپێی پزیشکی بۆ ئەم (موباح)ە و با بیخواتەوە نۆشی گیانی بێت!

لەم نموونانەی پێشەوە، دەبینیت کە حەق لە یەکێك زیاتر بوو، چونکە هەر پێنج بەشەکە هەموویان حەقن. ئایا دەتوانیت بڵێیت: (ئاو) تەنها چارەسەری‌یە و بەس؟ یان تەنها واجبە و هیچ حوکمێکی تری نی‌یە؟

هەر بە وێنەی ئەمەی باس کرا، ئەحکامەکانی خوای گەورە، بەهۆی هاندان و بەڕێ خستنی حیکمەتی خواوەند و، بەپێی شوێنکەوتووان، دەگۆڕرێن. کە دەشگۆڕرێن، بە حەق دەگۆڕرێن و، بە حەق دەمێننەوە و، هەموو یەکێك لە حوکمەکانی حەقن و بەرژەوەندی‌یان تێدایە.

بۆ نموونە[1]: زۆربەی ئەوانەی شوێن ئیمامی شافیعی دەکەون - خوای لێ ڕازی بێت - لە چاو شوێنکەوتوانی ئیمامی حەنەفی‌دا - خوای لێ ڕازی بێت - لە ژیانی دەشتەکێتی و گوندنشینی‌یەوە نزیکترن، کە ناگاتە ئاستی ژیانێکی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆ کۆمەڵ بکات بە یەکەیەکی یەکگرتوو. جا لەبەر ئەوەی هەموو یەکێك لەم جۆرە کۆمەڵەدا ئارەزوومەندی

(١) دوای ئەوەی مامۆستا نوورسی لە لاپەڕەکانی پێشوودا ڕوونی کردەوە کە ئەحکامە شەرعی‌یەکان لە خولگەی "عیللەت"دا دەخولێنەوە نەك "حیکمەت"، وا لێرەشدا نموونە دەهێنێتەوە بۆ ڕوونکردنەوەی حیکمەتی خواوەند لە گونجاویی مەزهەبەکان لەگەڵ سروشتی شوێنکەوتووانیاندا. کەواتە ئەم مەزهەبانە حەق و حیکمەتن لە هەمان کاتدا. (وەرگێڕ)

ئەوەیە کەچی لە دەروونی‌دا شك دەبات بەوپەڕی دڵ ئامادەیی و دڵنیایی‌یەوە بۆ خواوەندی ئەنجامدەری پێویستی‌یەکانی بدرکێنێت، ئەوا هەر یەکەیان بۆ خۆی پێداویستی‌یە تایبەتی‌یەکەی خۆی لە خوای گەورە داوا دەکات و پەنای بۆ دەبات. ئەوەتا هەرچەند مەئمووم و شوێن‌کەوتەی ئیمامە کەچی بۆ خۆی سوورەتی فاتیحە دەخوێنێت. ئەم کارەش خۆی لە خۆی‌دا و لە هەمان کاتدا عەینی حەق و حیکمەتە.

بەڵام زۆربەی زۆر و ڕەهای شوێنکەوتووانی ئیمامی ئەعزەم (ئەبووحەنیفەی نوعمان) لە شارستانێتی و ژیانی شارەوە نزیکترن، کە ئەمەش بۆ ژیانێکی کۆمەڵایەتی ئامادەیان دەکات.

هۆی نزیکیی ئەم مەزهەبەش لە شارستانێتی‌یەوە، ئەوەبوو کە زۆربەی حکوومەتە ئیسلامی‌یەکان شوێنکەوتەی ئەم مەزهەبە بوون. لەم مەزهەبەدا ئەو کۆمەڵەی کە لە نوێژدا یەك جەماعەت دەکەن، وەك یەك کەس وان و، یەك کەس بە ناوی هەموویانەوە دەدوێت. جا مادەم هەموو ئەوانی تر تەسدیقی ئەم دەکەن و بە دڵ پەیوەندی‌یان پێوەیەتی، ئەوا قسەی ئەو یەك کەسە لە حوکمی قسەی هەموویاندایە. کەواتە نەخوێندنی سوورەتی فاتیحە لە لایەن مەئمووم و شوێنکەوتەی ئیمامەوە، عەینی حەق و حیکمەتە.

نموونەیەکی تر:

لەبەر ئەوەی شەریعەت چەند بەربەستێك لە بەردەم سروشتی مرۆڤدا دادەنێت، تاکو لە سنووری خۆیان دەرنەچن و بەمەش تەمێ و ئامۆژگاری‌یان دەکات و، نەفسی مرۆڤی پێ پەروەردە دەبێت، ئەوا بەپێی مەزهەبی ئیمامی شافیعی - کە زۆربەی شوێنکەوتووانی خەڵکی دێهات و نیمچە دەشتەکی و سەرگەرمی کار کردنن - دەستنوێژ بە دەستکەوتن لە ئافرەت دەشکێت و، کەمێك چەپەڵی(نەجاسەت)یش زیانی هەیە. بەڵام بەپێی مەزهەبی حەنەفی کە زۆربەی شوێنکەوتووانی چوونەتە ناو ژیانی کۆمەڵایەتی‌یەوە و نیمچە خاوەنێکی شارستانێتین، ئەوا دەستنوێژ بە دەست بەرکەوتن لە ئافرەت ناشکێت و، بە ئەندازەی درهەمێکیش چەپەڵی(نەجاسەت) بواری دەدرێت و زیانی نی‌یە.

با ئێستا سەیری کرێکارێك (جوتیارێك) و فەرمانبەرێك بکەین. دەبینین کرێکارەکە بە حوکمی ئیش و کاری لە لادێ‌دا زیاتر تووشی تێکەڵی و دەستکەوتن لە ئافرەتی بێگانە و دانیشتن لەگەڵیان لە دەوری یەك ئاگرداندا دەبێت و، دەچێتە ناو چەندین جێگای چەپەڵەوە. هەموو ئەمانەی بە حوکمی گوزەران و کار و پیشەکەی تووش دەبێت: دوور نی‌یە نەفسی ئەممارە دەرفەتێکی بۆ بڕەخسێنێت کە لە سنووری خۆی دەربچێت. لەبەر ئەوە، شەریعەت زایەڵەیەکی ئاسمانی دەهاوێتە ناو هەناوی ئەو مرۆڤەوە و فەرمانی پێ‌دەدات کە: دەست لە شتێك مەدە دەستنوێژەکەت بشکێنێت و نوێژەکەت بەتاڵ بکاتەوە.

بەڵام ئەو فەرمانبەرە، بەپێی نەریتی کۆمەڵایەتی بەو جۆرە تووشی تێکەڵبوونی ئافرەتی نامەحرەم نابێت – بە مەرجێك مرۆڤێکی ڕەوشت بەرز بێت – وە زۆر خۆی تووشی پیس و چەپەڵی ناکات و، شوێن هۆکارەکانی پاك و خاوێنیی شارستانێتی دەکەوێت. لەبەر ئەوە، شەریعەت لە ئاستی ئەودا توندیی نەنواندووە، بەڵکو لایەنی (ڕوخسەت)ی لە بریی لایەنی (عەزیمەت) بۆ دەرخستووە و، بە ناوی مەزهەبی حەنەفیەوە ئەمەی لەسەر ئاسان کردووە و، پێی دەڵێت: ئەگەر دەستت بەر ئافرەتێکی نامەحرەم کەوت دەستنوێژت ناشکێت و، ئەگەر شەرمت لە ئامادەبووان کرد و بە ئاو خۆت پاك نەکردەوە، زیانی نیە، چونکە چاوپۆشی لە ئەندازەی درهەمێك "نەجاسەت" کراوە.

ئیتر بەمە، لە وەسوەسە و دوودڵی، ڕزگاری دەکات.

ئەم دوانە: دوو دڵۆپی دەریان و، بۆ نموونە هێنامانەوە، دەتوانیت قیاسی شتی تریان لەسەر بکەیت. خۆ ئەگەر توانیت تەرازووەکانی شەریعەت بە تەرازووکاریی (شەعرانی) و بەم جۆرەی باسمان کرد، بپێویت، ئەوا بیکە.

**﴿سبحانكَ لا علمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنك أنت العليمُ الحكيم﴾.**

اللّهُمَّ صَلِّ وسَلِّم على مَنْ تمثّلَ فيهِ أنوَارُ مَحبَتــــكَ لجمَـــالِ صِفَـــاتكَ وأسمائكَ، بكونهِ مرآةً جامعةً لتَجليَات أسمائكَ الحُسنى، ومنْ تمركـــزَ فيـــه شعاعَاتُ محبّتكَ لصَنعتكَ في مَصنوعَاتك بكونهِ أكمَل وأبدع مَصنوعَـــاتك، وصَيرُورته أنموذَج كمَالات صَنعتكَ، وفهرستَة مَحاسِن نُقوشـــكَ، ومَـــنْ تَظاهرَ فيه لطائف محبتك ورَغبتك لاستحسان صَنعتك بكونه أعلـــى دلاّلي مَحاسن صَنعتك وأرفَع المُستحسنينَ صَوتاً في إعلانِ حُسن نُقوشك وأبدعهُم نعتاً لكمالاتِ صَنعتكَ، ومن تجمَع فيه أقسَام محبتكَ واســتحسَانك لمحاســن أَخلاقِ مَخلوقاتكَ ولَطائفِ أوصَاف مَصنوعاتكَ، بكَونه جَامعـــاً لمحاســن الأخلاق كافّة باحسَانك وللطائف الأوصافِ قاطبة بفَضلكَ، ومـــنْ صَـــار مِصدَاقاً ومقيَاساً فائقاً لجميعِ من ذكرت في فرقَانك أنَكَ تحبهم منَ المُحســنين والصَّابرينَ والمُؤمنينَ والمُتقين والتوَّابين والأوّابينَ وجَميع الأوصَاف للذيـــن أحببتهم وشَرّفتهم بمَحبتكَ في فرقَانكَ حتى صَار إمام الحبيبينَ لكَ، وسَـــيد المَحبوبينَ لكَ ورئيسُ أودّائك وَعلى آلهِ وأصحَابهِ واخوَانهِ أجمعـــينَ. آمـــين برحـــمتكَ يا أرحـــم الرّاحـــمينَ.

# پاشکۆی
## وتەی بیست و حەوتەم

### تایبەتە بە هاوەڵە بەڕێزەکانەوە، خوایان لـێ ڕازی بێت

وەك مەولانا جامی دەفەرمویٚ منیش دەڵێم:

یارسول الله چه باشد چون سـگ أصحاب کهف
داخـــل جنـت شـــوم در زمـرهء أصحـاب تـو؟
أو رود در جنــت و مـن در جهنـم کی رواســت
أو سگ أصحاب کهف و من سگ أصحاب تو(١)

باسمه سبحانه

﴿وان من شئ الا يسبح بحمده﴾

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ والّذينَ مَعهُ أَشِدّاءُ على الكُفَّارِ رُحَماءُ بَيْنَهُم تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللهِ وَرِضْوَاناً سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾ (الفتح: ٢٩)

برای بەڕێزم! پرسیارت کردبوو:

---

(١) بەڕێز "خولووصی بەحیا گیل" کە یەکێکە لە قوتابی‌یە دێرینەکانی مامۆستا نوورسی، دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (لە ساڵی ١٩١٦دا لـە جەبهـەی قـەفقاس بـووم، ئەفسـەرێکی ئیحتیـاتی کـەرکووکیمان لەگەڵدا بوو، زاوای شـێخ ڕەزای تاڵەبانی بـوو. ئەم پارچەیەم لـەو وەرگرت کە لـە ژوورەکـەی شـێخ ڕەزا لـە تەکیـەی تاڵـەبانیی کـەرکووك هەڵواسرابوو:

یا رسول الله چه باشد چون سگ أصحاب کهف..... هتاد

پاشـان کـە ناسراویم لەگـەڵ مامۆستا نوورسی‌دا پـەیدا کـرد، ئـەم پارچەیـەم بـۆ نـاردو، لـە داوێنیـەوە تکـام لـێ کردبوو کە لە نێوان قوتابییانی نووردا بە (قطمیر)، کە ناوی سەگەکەی ئەسحابولکەهفە، قبوولـم بکات. مامۆستایش لە وەڵامدا بۆی نووسیم: لـە خـوا داواکـارین کـە یـەکێك بیـت لـە پێشـکەوتووانی ئەسـحابولکەهف.. وشەی (قطمیر) لە نامەکەتدا لا بیە، وا ئێمە لامان برد. بڕوانە: "Son Şahitler. N. Şahiner. 1/38"

(وەرگێڕ)

چەند ڕیوایەتێك هەن ئەوە دەگەیەنن کە لەکاتی بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی بیدعەتدا هەندێ ئیمانداری ڕاست دەگەنە پلەی هاوەڵە بەڕێزەکان، تەنانەت لەوانەیە پێشیشیان بکەون! ئایا ئەم ڕیوایەتانە صەحیحن؟ ئەگەر صەحیحن حەقیقەتەکەیان چییە؟ تکایە ڕوونی بکەرەوە.

**وەڵام:** ئیجماعی ئەهلی سوننەت و جەماعەت سەبارەت بەوەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە دوای پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - باشترین مرۆڤن، ئەم ئیجماعە بەڵگەیەکە هیچ گومانێکی لێ ناکرێت و جێگای بۆ وتوویژ لەم مەسەلەیەدا نەهێشتووەتەوە. جا هەرکام لەو ڕیوایەتانە صەحیح بن، ئەوا چاکەکارییە جوزئییەکانی ئەو ئیماندارانە دەگرێتەوە، نەك کوللییەکان. چونکە هەندێ جار لە چاکە جوزئییەکاندا (مەرجووح) بەسەر (ڕاجیح)دا تەرجیح دەدرێت. دەنا سەبارەت بە چاکەکارییە گشتییەکان هیچ کەسێك ناگاتە پلەی ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە خواوەند لە قورئانی پیرۆز و تەورات و ئینجیلدا وەسف و ستایشی کردوون، وەك لە کۆتایی سوورەتی "الفتح"دا باسی ئەمەی کردووە.

وا سێ حیکمەت کە سێ هۆیان تێدایە، لە نێوان چەندین هۆ و حیکمەتی زۆردا، باس دەکەین:

**حیکمەتی یەکەم:**

هاوەڵێتیی پێغەمبەر ﷺ ئیکسیرێکی مەزنە و، کاریگەرییەکی ئەوەندە لەعادەت بەدەری هەیە، کە هەر کەسێك ماوەی یەك خولەك پێی شەرەفمەند ببێت، ئەوەندە نووری حەقیقەتی دەست دەکەوێت کە ئەوانەی چەندین ساڵی تەمەنیان لە سەیر و سلووکی پەروەردەی ڕۆحیدا بەسەر دەبەن، دەستیان ناکەوێت. چونکە هاوەڵێتیی پێغەمبەر ﷺ بریتییە لە ڕەنگ گرتن بە ڕەنگی "ڕاستی" و تیادرەوشانەوەی ڕووناکیی حەقیقەت. مرۆڤ بەهۆی درەوشانەوەی ئەو نوورە تیایدا، دەتوانێت بگاتە چەندین پلە و پایەی بەرز و، بە بۆنەی شوێنکەوتن و نیسبەت پەیدا کردن لەگەڵ ئەو نوورەدا بە چەندین مەقامی زۆر شەرەفمەند ببێت. ئەو هاوەڵە لەمەدا وەك خزمەتگوزاری پادشا وایە، کە دەتوانێت بگاتە شوێنی وا کە میر و پێشەوایانی سوپای پادشا ناتوانن پێی بگەن.

هەر بەهۆی ئەم نهێنییەوەیە کە دەبینین گەورەترین وەلی لە ئەولیا پیاوچاکەکان، ناتوانێت بگاتە پلەی هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەری مەزن ﷺ تەنانەت ئەو وەلییانەش کە هەر لە حاڵی بێدارییدا شەرەفمەندی بەخزمەت گەیشتنی پێغەمبەر ﷺ بوون، وەك (جەلالەددینی سیووطی)، ئەمانەش هێشتا ناگەنە پلەی هاوەڵان، خوایان لێ ڕازی بێت.

چونكە هاوەڵە بەڕێزەكان بە (نووری نبووەت) هـاوەڵێتیی پێغەمبـەریان دەكـرد. واتـە لـەو حاڵەتـەدا هـاوەڵی بـوون كـە پێغەمبـەر ﷺ پێغەمبـەر و ڕەوانـەكراو بـووە. بـەڵام وەلی‌یـە پیاوچاكەكان، پێغەمبەریان لە دوای وەفاتی، واتە دوای تـەواوبوونی "وەحـی" دیـوە، كەواتـە هاوەڵێتی و بەخزمەت گەیشتنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ بە (نووری ویلایەت) بووە. واتە دەركەوتنی پێغەمبەر ﷺ لە بەرچاوی ئەواندا، لە ڕوانگەی (ویلایەتی ئەحمەدی)یەوەیە، نەك (نبووەت).

مادەم ئەمـە وایە، ئەوا دەبێ ئەم دوو هاوەڵێتی‌یـە بـە ئـەندازەی بـەرزیی پلـەی (نبـووەت) بەسەر پلەی (ویلایەت)دا لە یەك جیابن.

بۆ ڕوونكردنەوەی كاریگەریی لەعادەت‌بەدەر و ڕووناكیی مەزنی هـاوەڵێتیی پێغەمبـەر ﷺ بەهۆی (نبووەت)ەوە، ڕەچاو كردنی ئەمەی خوارەوە بەسە:

لە كاتێكدا دەشتەكی‌یەكی دڵڕەق بە دەستی خۆی كچی خۆی زیندەبەچاڵ دەكـرد، هـەر تەنـها بەهــۆی ئامـادەبوونی كۆڕێكـی پێغەمبـەر ﷺ و هـاوەڵێتیی یـەك سـەعاتی ئـەو، هێنـدە دڵنەرمـی و سنگ فراوانی و ڕوونـاكیی گیـانی دەسـت دەكـەوت، كە خۆی لـە كوشـتنی مێروولـەیەكی بچووك دەپاراست!

یان یەكێكی تر كە هیچ یاسا و زانیاری‌یەكی شارسـتانێتیی نـەدیوە و نـەزانیوە، كـە ئامـادە دەبوو لـە كـۆڕی پێغەمبـەردا ﷺ، یەكسـەر دەبـوو بـە مامۆسـتای پێشـكەوتووترین نەتـەوەی خاوەن شارستانیی وەك هیند و چین و، بەوپەڕی دادگەری حوكمـی دەكـردن و بۆیـان دەبـوو بە نموونەیەكی بەرزی ڕەوشت و پێشەوایەكی باشی چاولێكراو.

**حیكمەتی دووهەم:**

لە پەیامی (ئیجتیهاد)دا چەسـپاندمان كـە هاوەڵـە بـەڕێزەكانی پێغەمبـەر ﷺ لـە چڵەپۆپـەی كـەماڵی مرۆڤایەتیدان. چـونكـە ئەو ئاڵوگۆڕە مەزنەی كە ئیسلام لە ڕەوتی ژیانی ئەو كاتەدا - چ لە تاك و چ لـە كۆمـەڵدا - ئـەنجامی دا و هێنایـەدی، جوانیـی حـەق و چاكـەی بەوپـەڕی ڕوونـی دەرخسـت و، پەردەشـی لـە ڕووی ناشیرینی و چەپەڵیی شـەڕ و ناحـەقی لابـرد. بـە ڕادەیەك كە هەریـەك لـە حـەق و ناحـەق و ڕاسـت و درۆ، ئـەوەندە بە ڕوونـی دەركـەوتن كـە دەتوت بە دەست لە یەك جیا كراونەتەوە و، ئەندازە و مـاوەی دووریـی نێـوان خێر و شـەڕ و، ڕاست و درۆ، بە ئەندازەی دووریی نێوان ئیمان و كوفر و بەهەشت و دۆزەخ، فراوانیی پەیدا كرد.

لەبەر ئـەوە، هاوەڵـە بـەڕێزەكانی پێغەمبـەر ﷺ كـە هەسـتی بـەرز و سروشـتی تـەواویان پـێ بەخشراوە و، ئارەزوومەندی ڕەوشتی جوان و كاروباری بەرزن، ڕوانینـی خۆیـان بـەرەو ئـەو

پێغه‌مبه‌ره خۆشه‌ویسته ﷺ ئاراسته كردبوو كه له‌سه‌ر چڵه‌پۆپه‌ی هه‌ره به‌رزی كه‌ماڵی مرۆڤدایه و، خاوه‌نی بانگه‌وازی خێر و حه‌ق و ڕاستی‌یه، ته‌نانه‌ت نموونه‌ی هه‌ره‌به‌رزی ته‌واوی مرۆڤه، كه محه‌ممه‌دی پێغه‌مبه‌ری به‌ڕێزمان و خۆشه‌ویستی خواوه‌ندی په‌روه‌ردگاری هه‌موو جیهانه‌كانه ﷺ ئیتر ئه‌وان به‌هۆی سروشت و فیتره‌تی پاكی خۆیان، سه‌رجه‌می ئه‌و هێزه‌ی كه خوا پێی به‌خشیبوون بۆ ئه‌وه‌یان ته‌رخان كردبوو كه له‌ ژێر ئالآكه‌ی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌دا بن ﷺ و هه‌رگیز ئه‌وه‌یان لێ ده‌رنه‌كه‌وت كه مه‌یلیان به لای موسه‌یله‌مه‌ی درۆزندا بچێت، كه نموونه‌ی درۆ و شه‌ڕ و ناحه‌ق و خورافات بوو.

بۆ ڕوونكردنه‌وه‌ی زیاتر، ئه‌م نموونه‌یه‌ی خواره‌وه ده‌هێنینه‌وه:

جار جار له بازاڕی شارستانێتیی مرۆڤ و پیشانگای ژیانی كۆمه‌لآیه‌تی‌دا هه‌ندێ شتی وا پێش‌چاو ده‌خرێن كه كاریگه‌ری‌یان وه‌ك كاریگه‌ریی ژه‌هر وایه و ئه‌نجامی چه‌پەڵیان هه‌یه و. هه‌موو ئه‌و كه‌سانه‌ی كه خاوه‌نی سروشتی ساغ و ته‌واون دوور ده‌كه‌ونه‌وه لێی و به هیچ جۆرێك توخنی ناكه‌ون.

به هه‌مان جۆریش چه‌ندین كه‌ره‌سه‌ی مه‌عنه‌وی و شتی تر له هه‌مان بازاڕدا ده‌خرێنه پێش‌چاو، كه ئه‌وه‌نده ئه‌نجامی جوان و كاریگه‌ریی باشیان ده‌بێت به ڕاده‌یه‌ك سه‌رنجی خه‌ڵك بۆ لای خۆیان ڕابكێشن و، وه‌ك ده‌رمانی ده‌رده‌كانی كۆمه‌ڵ وابن. له‌به‌ر ئه‌وه، هه‌موو ئه‌وانه‌ی كه به سروشت و فیتره‌ت چاكه‌خوازن، به‌ره‌و ڕوویان ده‌ڕۆن.

به‌م جۆره، له بازاڕی ژیانی كۆمه‌لآیه‌تیی سه‌رده‌می پڕ له به‌خته‌وه‌ریی پێغه‌مبه‌رێتی‌دا - كه له هه‌موو سه‌رده‌مێك چاكتره - چه‌ندین جۆر شتی تێدا پێش‌چاو خراوه. شتێكی به‌دیهی و ئاشكرایه كه هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌كان به بۆنه‌ی سروشته بێ‌گه‌رد و ڕه‌وشته به‌رزه‌كانی خۆیانه‌وه، له‌و بازاڕه‌دا به‌ره‌و ڕاستی و خێر و حه‌ق بڕۆن و، له هه‌موو ئه‌و شتانه‌ش دووره‌په‌رێزی بكه‌ن كه ئه‌نجامی خراپ و ده‌ردی سه‌ریی دنیا و قیامه‌تیان تێدایه، وه‌ك درۆ و شه‌ڕ و كوفر. ده‌بینیت له ده‌وری ئالآكه‌ی پێغه‌مبه‌ری به‌ڕێز ﷺ كۆ بوونه‌وه و، له گاڵته‌جاڕی‌یه‌كانی موسه‌یله‌مه‌ی درۆزنیش، كه نموونه و نوێنه‌ری درۆ و ده‌له‌سه و شه‌ڕ و ناحه‌قی‌یه، دوور كه‌وتنه‌وه.

به‌ڵام به‌ره به‌ره و ڕۆژ له دوای ڕۆژ هه‌موو شتێك گۆڕا و، وه‌ك ئه‌و باره‌ی سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ر ﷺ، كه چاكترین سه‌ده و سه‌رده‌م بوو، نه‌مایه‌وه. به‌ڵكو ئه‌ندازه و ماوه‌ی نێوان ڕاست و درۆ ورده ورده و تا به‌ره‌و سه‌رده‌مه‌كانی ئێستامان نزیك ببینه‌وه، كه‌م بووه‌وه، به ڕاده‌یه‌ك كه له‌م سه‌رده‌مه‌ی خۆماندا ڕاستی و درۆ به یه‌كه‌وه‌ن و هاوشانی یه‌كترن، ئه‌وه‌تا

هەردووکیان لە یەك پیشانگادا دادەنرێن و لە یەك سەرچاوەیشەوە دەردەچن! لە ئەنجامی ئەمەشدا ڕەوشت و تەرازووە کۆمەڵایەتی‌یەکان تێکچوون و دووچاری ئاڵۆزی بوون. ئەوەش کە زیاتر ناشیرینیی "درۆ"ی سامناك و، جوانیی "ڕاستی"ی ڕووناکی داپۆشیوە، پڕوپاگەندە سیاسی‌یەکانە!

ئایا ئیتر لە سەردەمێکی ئاوادا کەس جورئەت و پڕکێشی دەکات و لافی ئەوە لێ دەدات کە بڵێت: دەتوانم لە پلەوپایەی ئەو مرۆڤە مەزن و بەڕێزانەوە نزیك ببمەوە کە لە یەقین و تەقوا و دادگەری و ڕاستی و بەختکردنی خۆیان و شتە بەنرخەکانیان لە پێناوی حەقدا، گەیشتوونەتە پلەیەك کە هیچ کەسێکی غەیری ئەوانی پێ نەگەیشتووە؟ کەس هەیە پڕکێشیی ئەوە بکات و لافی نزیکبوونەوە لەوان لێ‌بدات، چ جای ئەوەی پێشیان بکەوێت؟

وا حاڵەتێکتان بۆ باس دەکەم کە بەسەر خۆمدا هاتووە و، لایەنێکی ئەم مەسەلەیە ڕوون دەکاتەوە:

ڕۆژێکیان ئەم پرسیارەم بە دڵدا هات: بۆچی کەسانی پایەبەرزی وەك "محیّدینی عەرەبی" ناگەنە پلەی هاوەڵە بەڕێزەکان؟

پاشان لە کاتی وتنی: (سبحان ربي الاعلى)ی سوژدەی نوێژدا، سەرنجم دا شتێکم لە ڕاستی‌یە مەزنەکانی واتای ئەم وشە پیرۆزە، ناڵێم هەمووی، بۆ دەرکەوت. لە دڵی خۆمدا وتم: خۆزگا نوێژێکی تەواوم بۆ دەرەخسا، کە وەك ئەمەم لە واتای ئەم وشە پیرۆزەوە بۆ دەرکەوت، هی هەموو ئەو نوێژەم بەو شێوەیە بۆ دەربکەوتایە، چونکە ئەوەم لە پەرستنی ساڵێکی تەواوی (نەوافیل) باشتر دەبوو.

لە دوای نوێژەکە بۆم دەرکەوت کە ئەو خاتیرەیە و ئەو حاڵەتە وەڵامی پرسیارەکەم بوو. واتە ڕێنمایی کردم بۆ ئەوەی کە مەحاڵە هیچ کەسێك لە پەرستندا بگاتە پلەی هاوەڵە بەڕێزەکان. چونکە ئەو گۆڕانکاری‌یە کۆمەڵایەتی‌یە مەزنەی کە قورئانی پیرۆز بە ڕووناکی‌یە درەخشانەکەی خۆی هێنایەدی، هەموو شتە دژ بەیەکەکانی لە یەکتر جیا کردەوە. ئەوەبوو هەموو خراپکاری و تاریکی‌یەکی لە بەرامبەر خێر و کەماڵات و ڕووناکی و ئەنجامەکانیەوە ڕاوەستاند. ئا لەم حاڵەتەدا کە حاڵەتێکی وایە هەموو هاندەرەکانی خێر و شەڕ هەڵدەنێت کە سەربەستی وەربگرن، لە لای خێرخواهان هاندەرەکانی خێر و چاکە بێداربوونەوە و، ئنجا واتاکانی هەموو (زیکر و، تەسبیح و، تەحمید)ێك لایان بە تەواوی دەرکەوتن و بە جۆرێکی تەڕ و پاراو دەردەبڕران. ئیتر هەموو هەستە ناسك و لەتائیفە خاوێنەکانیان ـ تەنانەت خەیاڵ و

ڕازیشیان ـ شیله‌ی واتا هه‌ره به‌رزه‌كانی ئه‌و زیكرانه‌یان به چه‌شنێكی بێ گه‌رد و بێدارانه و به‌پێی چێژه ناسكه‌كانیان، نۆشی.

ئه‌و هاوه‌ڵه به‌ڕێزانه‌ی كه خاوه‌نی هه‌ستی ناسك و وریا و له‌طائیفی هه‌میشه بێدار بوون، كاتێ كه ئه‌و وشه پیرۆزانه له‌به‌ر خۆیانه‌وه ده‌ڵێنه‌وه (كه ڕووناكی‌یه‌كانی ئیمان و ته‌سبیح و ته‌حمیدیان تێدا كۆ بووه‌ته‌وه) هه‌ست به هه‌موو واتاكانیان ده‌كه‌ن و، به هه‌موو له‌طائیفه پاك و بێ گه‌رده‌كانیان له هه‌ریه‌ك له‌و وشانه به‌هره و به‌شی خۆیان وه‌رده‌گرن.

به‌ڵام ڕۆژگار هات و ڕۆشت و، ئه‌و بار و دۆخه ته‌ڕ و پاراو و نوێیه نه‌ما و، ورده ورده گۆڕا، تا هه‌موو له‌طائیفه‌كان خه‌وێكی قورسیان لێ كه‌وت و، هه‌سته‌كانیش بێ‌ئاگایی سه‌ری تێ كردن و وازیان له حه‌قیقه‌ته‌كان هێنا! ئیتر به‌ره‌كانی دوای ئه‌وان ورده ورده توانای چه‌شتنی پاراویی ئه‌و وشه پاك و پیرۆزانه و له‌زه‌ت وه‌رگرتنیان له ته‌ڕی و تامه‌كانیان له‌ده‌ست دا و، ئه‌م وشانه لای ئه‌وان وه‌ك ئه‌و جۆره "میوه"یه‌یان لێ هات كه جوانی و ته‌ڕی و پاراویی نه‌مابێت و، به‌شێكی كه‌می نه‌بێت ئیتر ئه‌وانی تری وشك بووبن. ئه‌م به‌شه كه‌مه‌یش به ماندوو كردنی زیهن و، بیر كردنه‌وه‌ی قووڵ و، به‌كار بردنی وزه و ماندووبوونی زۆر نه‌بێت به‌ده‌ست ناهێنرێت. له‌به‌ر ئه‌مه، ئه‌و به‌رزی و پله و پایه‌یه‌ی كه هاوه‌ڵێكی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له چل ده‌قیقه‌دا ده‌ستی ده‌كه‌وت، غه‌یری هاوه‌ڵان، مه‌گه‌ر له چل ڕۆژ، به‌ڵكو له چل ساڵدا ئنجا ده‌ستی بكه‌وێت! ئه‌مه‌ش به‌هۆی فه‌زڵی هاوه‌ڵێتیی به فه‌ڕ و پیرۆزی پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ له ڕوانگه‌ی "نبووه‌ت"ه‌كه‌یه‌وه.

**هۆی سێهه‌م:**

له وته‌كانی (دوازده‌هه‌م و، بیست و چوارەم و، بیست و پێنجه‌م)دا چه‌سپاندوومانه كه:

ئه‌ندازه‌ی "نبووه‌ت" له چاو "ویلایه‌ت"دا وه‌ك ئه‌ندازه‌ی خۆری ئاسمان وایه سه‌باره‌ت به وێنه ئاشكراكه‌ی له‌ناو ئاوێنه‌دا. له‌به‌ر ئه‌وه، پایه‌به‌رزیی كارگوزارانی بازنه‌ی "نبووه‌ت" كه هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌كانن و له هه‌موو كه‌سێك زیاتر له‌و خۆره ڕووناكه‌وه نزیكتر بوون، به‌سه‌ر ئه‌ولیا پیاوچاكه‌كاندا به هه‌مان به‌رزیی پله و پایه‌ی بازنه‌ی "نبووه‌ت"ه به‌سه‌ر بازنه‌ی "ویلایه‌ت"دا. ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر یه‌كێك له ئه‌ولیاكان پله‌ی "ویلایه‌تی كوبرا"ش به‌ده‌ست بهێنێت، كه پله‌ی میراتگرانی پێغه‌مبه‌ران و صیددیقان و، ویلایه‌تی هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌كانه، هێشتا ناگاته پله‌ی ئه‌و هاوه‌ڵه هه‌ڵبژارده و پێشینانه‌ی پۆلی یه‌كه‌م، خوایان لێ ڕازی بێت.

وا له نێوان ڕووه زۆره‌كانی هۆی سێهه‌مدا، سێ "ڕوو" ڕوون ده‌كه‌ینه‌وه:

*ڕووی یەکەم:*

لـە مەسـەلەی ئیجتیـهاددا، کـە وەرگرتـن و دەرهێنـانی ئەحکامـە شـەرعی‌یەکانە، واتـە لـە زانینی ئەو شتانەدا کـە مایـەی ڕەزامـەندیی خـوای گـەورەن، هـەرگیز مومکـین نی‌یــە هیــچ کەسێك بە هاوەڵە بەڕێزەکان بگاتەوە. چونکە ئەو ئاڵوگۆڕە مەزنەی کە خواوەند لەو کاتەدا هێنایەدی تەنها لە یەك خولـگەدا دەخولایەوە، ئەویش بریتی بوو لە: بەدەستهێنانی ڕەزامـەندیی خوا لـە ڕێگـای تێگەیشتنەوە لـە ئەحکامـەکانی. لەبـەر ئـەوە، دەرگـای زەینـەکانی ئـەو کاتـە هەموو ڕووەو دەرهێنانی ئەحکامەکان لەسەرپشت بوون و، دڵـەکانیش پەرۆشـی ئـەوە بـوون کە بزانن: (ئایا پـەروەردگارمان چیـی لێمـان دەوێـت)؟ هـەرچی وتووێژی ئـەو کاتـە بـوو لـە بارەی ئەم واتایانەوە بوون و، هەموو بارودۆخ و ڕووداوەکـانیش لـە ڕۆشـنایی ئـەو واتایانـەدا ڕوویان دەدا.

جا لەبەر ئـەوەی کـە هـەرچی بـار و وتووێـژ و کۆڕبەسـتن و گفتوگـۆی ئـەو کاتـە بـوون، هەموویان بـەپێی ڕێنمـایی ئـەم واتایانـە بـوون، ئەوا ئـەم بارودۆخانـە قابیللییـەتی هاوەڵـەکانی دەرەخسـاند و، بـیری ڕوونـاك دەکردنـەوە و، لێـهاتن و توانـای ئـەوانی دادەگیرسـاند و، بـۆ ئیجتیهاد و دەرهێنانی ئەحکام ئامادەی دەکردن. چونکە ئەوان لە یەك ڕۆژ یان لە یەك مانگدا ئەوەندە توانا و (مەلەکە)ی ئیجتیهاد و دەرهێنانی ئەحکامیان بەدەست دەهێنا، کە لەم کاتەی ئێمـەدا ئەگـەر کەسـێك لـە ئاسـتی زیرەکیی ئـەواندا بێـت، بـە دە سـاڵ بـەڵکو بـە سـەد سـاڵ نەتوانێت بەدەستی بهێنێت.

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لەم کاتەی ئێسـتای ئێمـەدا هـەرچی ڕوانینـە ڕووەو دەسـتکەوتنی ژیـانێکی دنیـایی شـاد ئاراسـتە کـراوە، لـە بریـی بەختـەوەریی هـەمیشـەیی قیـامـەت و ژیـانی پڕ لـە نـاز و نیعمـەتی نـەبڕاوەی ئـەوێ، کـە لـەم کاتـەدا ڕوویـان لـێ وەرچەرخێنراوە و پشتیان تێ کراوە. ئەوەتا خەم و خەفـەتی ژیـان – کـە بـە بۆنـەی تـەوەککول نەبوون لەسەر خوا، هەردەم لە زیادبووندایە – قورسـایی خـۆی دەهاوێتـە سـەر مـرۆڤ و وای لـێ دەکات کە هەمیشە لە دوودڵی و دڵەتەپێ‌دا بێت. فەلسەفەی ماددی و سروشتیش عـەقڵی مرۆڤ کـول و بەسیرەتیشی کوێـر دەکـات. کەواتـە ئـەم دەوروبـەرە کۆمەڵایەتی‌یـە هـەروەك یاریدەی زەینی ئەو مرۆڤـە (زیرەکـە) نـادات و پشـتی ئامادەیی‌یـە سروشتی‌یەکەشـی نـاگرێت، زیاتر شپرزە و پتر ماندوویشی دەکات.

لە پەیامی (ئیجتیهاد)دا بەراوردێکمان لە نێوان (سوفیانی کوڕی عویەینە) و ئـەو کەسـەدا کرد کە لەم چەرخەی ئێستادا دەژی و لە ئاستی زیرەکیی ئەودایە. لە ئـەنجامی بەراوردەکـەدا

گەیشتینە ئەوەی کە: ئەو توانای ئەحکام دەرهێنانەی سوفیان لە سەردەمی خۆیدا و لە ماوەی دە ساڵدا دەستی کەوتووە، ئەم ناتوانێت لەم سەردەمەی ئێمەدا بە سەد ساڵیش بەدەستی بهێنێت.

*ڕووی دووهەم:*

هەرگیز مومکین نی‌یە بە هەنگاونانی "ویلایەت" کەس بگاتە پلەی "هاوەڵە بەڕێزەکان" لە بارەی نزیکی‌یانەوە لە خوای گەورە. چونکە خواوەند (لە ڕەگی لامل لێمانەوە نزیکترە) بەڵام ئێمە تابڵێی لێیەوە دوورین. مرۆڤیش هەر تەنها بەم دوو شێوەیە دەتوانێت نزیکیی لە خواوە دەست بکەوێت:

شێوەی یەکەم: لە ڕێگەی دەرکەوتنی "ئەقرەبییەتی" خوای گەورەوە لە بەندەکانی[1]. نزیکیی "نبووەت" لە خواوەندەوە لەم جۆرە دەرکەوتنەیە. هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوەی میراتگری (نبووەت) و شەرەفمەندی هاوەڵێتیی نەبەوین، بەم دەرکەوتنە بەهرەمەند بوون.

شێوەی دووهەم: لە ڕووی دووریی ئێمەوە لە خوای گەورە. چونکە لەم ڕێگایەوە شادبوون بە هەر نزیك بوونەوەیەك لە خواوەند، بە بڕینی چەندین پلە دەبێت. جا زۆربەی ڕێگاکانی "ویلایەت" و، هەموو ئەو سەیر و سلووکانەی تیایاندایە، چ (سەیری ئەنفوسی) بێت، چ (سەیری ئافاقی) بەپێی ئەم شێوەی دووهەمە دەبێت.

شێوەی یەکەمیان کە بریتی‌یە لە دەرکەوتنی: (ئەقرەبییەتی خواوەند) واتە نزیکیی لە بەندەکانیەوە، بەخششێکی خوایی‌یە و هەرگیز بە کەسب و هەوڵدان دەست ناکەوێت. بەڵکو ڕاکێشان و بکێشێکە لە لایەن خواوەندی میهرەبانەوە و، خۆشەویستی‌یەکی بێ گەردە. چونکە ڕێگایەکە زۆر کورتە، بەڵام مەحکەم و دامەزراوە، تابیشڵێی بەرز و خاوێنە و هیچ سێبەر و لێڵی‌یەکی تێدا نی‌یە.

بەڵام شێوەکەی تری نزیك بوونەوە لە خوای گەورە، ڕێگایەکی کەسبی‌یە و، یەکجار دوورە و، تێکەڵوپێکەڵ و سایەدارە. خۆ هەرچەندەش خەواریقی زۆرە، بەڵام سەبارەت بە گرنگی و نزیك بوونیەوە لە خوای گەورە، هێشتا هەر ناگاتە شێوەی یەکەم.

با ئەمە بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە:

لەمڕۆدا بۆ گەیشتن بە (دوێنێ) دوو ڕێگا هەیە:

یەکەم: خۆدامالین لە هاتوچۆ و ڕووداوەکانی (کات) و سەرکەوتن بەهۆی هێزێکی قودسی‌یەوە بۆ سەرڕووی زەمان و بینینی دوێنێ وەك ئەمڕۆ.

---

(١) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ونحن أقربُ اليه من حبل الوَريد﴾ (ق: ١٦). (وەرگێڕ)

دووهەم: بڕینی ماوەی ساڵێکی ڕەبەق تاکو سەرلەنوێ بە دوێنێ بگەینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانیت بیگریت. چونکە بەجێت دەهێڵێت و دەڕوات!

بە هەمان جۆر ڕۆشتنیش لە ظاهیرەوە بۆ حەقیقەت، بە دوو شێوە دەبێت:

یەکەمیان: کشانی ڕاستەوخۆ بەرەو حەقیقەت و دەستکەوتنی "ڕاستی" لە دووتوێی هەمان شتی ئاشکرا و بینراودا، بە بێ چوونە ناو بەرزەخی تەریقەتەوە.

دووهەمیان: بریتی‌یە لە بڕینی چەندین پلە و پایەی زۆر بەهۆی سەیر و سلووکەوە.

جا هەرچەند ئەهلی ویلایەت لە نەهێشتن و کوشتنی دەروونی بەدخوازدا سەرکەوتوو دەبن، بەڵام ناگەنە پلەی هاوەڵە بەڕێزەکان. چونکە دەروونی هەریەك لەو هاوەڵە بەڕێزانە خاوێن و پاکژکراو(مزکّـاة) بووە. بەم بۆنەیەوە و لە ڕێگای ئامێرە جیاجیا و زۆرەکانی دەروونەوە، چەندین جۆری پەرستن و شوکرانە و سوپاسگوزاری‌یان دەستکەوتووە. بەڵام عیبادەت و پەرستشی ئەولیاکان - لە پاش نەهێشتنی دەروون - ئاسان دەبێت[1].

*ڕووی سێ‌هەم:*

لە کردەوە چاکە بەرزەکان و، پاداشتیان و، پاداشتی دواڕۆژدا، مومکین نی‌یە کەس بە هاوەڵە بەڕێزەکان بگاتەوە. چونکە ئەو سەربازەی کە بۆ تەنها یەك سەعات و لە بارودۆخێکی توندوتیژی دەوروبەری خۆی‌دا و لە جێگایەکی گرنگی ترسناکدا ئێشك دەگرێت، پاداشتێکی ئەوتۆی دەست دەکەوێت کە لە بەرامبەر پاداشتی ساڵێکی پەرستنەوەیە[2]. خۆ ئەگەر لە ماوەی یەك خولەکدا یەك گوللەی بەر بکەوێت، ئەوا دەگاتە

---

(١) مامۆستا نوورسی لەم بارەیەوە لە کتێبی "المثنوي العربـي النوري" ص٣٧٨دا دەفەرموێت:
بزانە! دەروون(النفس) شتێکی سەیرە و گەنجینەی چەندین ئامێری لەژمارەبەدەر و، ئەرازووی بێ‌سنوورە بۆ هەستکردن بە درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خواوەند، ئەمە ئەگەر پاکژ(تزکیـة) بکرێت.. هەر ئەم دەروونە، ئەشکەوتی چەندین دووپشك و مار و مێرووە، ئەگەر لایەنی سەرپێچی و ستەم بگرێت. جا باشتر وایە (والله اعلـم) ئەم دەروونە بمێنێتەوە نەك لەناو ببرێت. چونکە مانەوەی لەگەڵ پاکژکردندا - وەك ئەوەی هاوەڵانی بەڕێزی لەسەر بووە - لەگەڵ نهێنیی حیکمەتدا گونجاوترە تاکو مراندنی بە تەواوی - وەك ئەوەی کە زۆربەی ئەولیاکانی لەسەرە. بەڵێ، برسێتی‌یەکی زۆر و، پێویستی‌یەکی گەورە و، چێژێکی سەیر لە کرۆك و بناغەی دەروونـدا هەیە، جا ئەگەر ڕەوتی هەڵسوکەوتەکانی بەرەو ئاراستەگەیەکی تر بگۆڕرێت، ئەوا ڕژدی‌یە خراپەکەی دەبێت بە تاسەیەکی تێرنەبوو و، لەخۆبایی‌بوونە شوومەکەیشی دەبێت بەهۆی ڕزگاربوون لە هەموو جۆرەکانی شیرك و، خۆشەویستی‌یە توندوتیژەکەیشی بۆ خۆی دەبێت بە خۆشەویستی‌یەکی زاتی بۆ پەروەردگاری خۆی... هەروەها بەم جۆرە، تاکو هەموو خراپکاری‌یەکانی دەبن بە چاکەکاری. (وەرگێڕ هێناویەتی)

(٢) فەرموودە لەم بارەیەوە زۆرە، وا چەند دانەیەك دەهێنین و، بۆ زیاتریش بڕوانە: (ریاض الصالحین) کتاب الجهاد:
"رباط یوم في سبیل الله خیر من الدنیا وما علیها..." متفق علیه عن سهل بن سعد.
"رباط یوم ولیلة خیر من صیام شهر وقیامه، وان مات فیه اجرى علیه عمله الذي کان یعمل وأجرى علیـــــه

پله‌یه‌كی ئه‌وتۆ كه‌ لـه‌ (ویلایـه‌ت)دا مه‌گـه‌ر به‌ لای كه‌مـه‌وه‌ بـه‌ (چـل ڕۆژ) ئنجا مرۆڤ پێـی بگات..

جا هـه‌روه‌ك ئه‌مه‌ وایه‌، جیـهادی هاوه‌ڵـه‌ به‌ڕێزه‌كانیش لـه‌ كـاتی دامـه‌زراندن و جێگـیر كردنی پایه‌ و بناغه‌كانی ئیسلام و، بڵاو كردنه‌وه‌ی ئه‌حكامی قورئان و، ئیعلانـی جـه‌نگ - بـه‌ نـاوی ئیسـلامه‌وه‌ - لـه‌ دژی هـه‌موو گێتـی، پله‌یـه‌كی ئـه‌وه‌نده‌ مـه‌زن و خزمه‌تگوزاریـیه‌كی هێنده‌ گه‌وره‌یه‌ كه‌ كاركردنی ساڵێكی ته‌واوی كه‌سانی تر ناگاته‌ كاری یه‌ك ده‌قیقه‌ی ئه‌وان. به‌ڵكو ده‌كرێ و، ڕاستیشه‌ گه‌ر بوترێت:

هه‌ر خوله‌كێك له‌ خوله‌كه‌كانی ژیانی هه‌موو یـه‌كێك لـه‌ هاوه‌ڵـه‌ بـه‌ڕێزه‌كان، وه‌كـو ئـه‌و خوله‌كه‌ وایه‌ كه‌ ئه‌و سه‌ربازه‌ی تێدا شـه‌هید كـراوه‌ و، هه‌ریـه‌ك لـه‌ سـه‌عاته‌كانی ته‌مه‌نیشیان وه‌ك سـه‌عاتی ئێشـك گرتنی ئـه‌و سـه‌ربازه‌یه‌ كـه‌ لـه‌ جێگایـه‌كی ترسناكدا ئێشك ده‌گرێـت، له‌وه‌دا كه‌ كاره‌كه‌ كه‌مه‌، به‌ڵام پاداشته‌كه‌ی تابلێی مـه‌زن و زۆره‌ و، گرنگیـیه‌كه‌شـی تـابڵێی گه‌وره‌یه‌.

به‌ڵێ، هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كان، یه‌كـه‌مین خشـتن لـه‌ دامـه‌زراندنی بناغـه‌ی كۆشـكی ئیسـلام و، ڕیـزی پێشـه‌وه‌ن لـه‌ بڵاوكردنـه‌وه‌ی ڕووناكیـیـه‌كانی قورئـانی پـیرۆزدا. كه‌واتـه‌ بـه‌پێی ده‌سـتووری: "السبب كالفـاعل" به‌شـێكی زۆری چاكه‌كاریـیه‌كانی نه‌تـه‌وه‌ی ئیسـلام هـی ئه‌وانه‌. ئه‌وه‌تا كاتێك كه‌ نه‌ته‌وه‌ی ئیسلام: "اللهم صلّ على سيدنا محمد وعلى آله واصحابـه وسـلم" دووپـات ده‌كاتـه‌وه‌ و ده‌یڵێتـه‌وه‌، به‌شه‌ زۆره‌كـه‌ی ئالی‌بـه‌یت و هاوه‌ڵـه‌ بـه‌ڕێزه‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ڕوون ده‌كاته‌وه‌ كه‌ له‌ چاكه‌كاریـیه‌كانی هه‌موو نه‌ته‌وه‌ی ئیسلامدا هه‌یانه‌.

جا بـۆ ئـه‌وه‌ی ئـه‌و به‌رهـه‌م و ئه‌نجامـه‌ مه‌زنـه‌ ڕوون بكه‌ینـه‌وه‌ كـه‌ له‌سـه‌ر بناغـه‌ی كـارێكی بچووكی سه‌ره‌تا دێته‌دی، وا ئه‌م نموونانه‌ی خواره‌وه‌ ده‌هێنین:

تایبه‌تكاریـیه‌كی گرنگی بچووك كه‌ له‌ ڕه‌گی ڕووه‌كدا بێت، دوایی له‌ لق و په‌لـه‌كانیدا شێوه‌یه‌كی گرنـگ وه‌رده‌گرێـت. كه‌واتـه‌ ئـه‌و تایبه‌تكاریـیـه‌ی ڕه‌گه‌كـه‌ لـه‌ مـه‌زنترین لـق گه‌وره‌تره‌..

هـه‌روه‌ها به‌رزبوونه‌وه‌یه‌كی بچووكی سـه‌ره‌تا، ورده‌ ورده‌ زیـاد ده‌بێـت تـا لـه‌ ئـه‌نجامدا ده‌بێت به‌ به‌رزبوونه‌وه‌یه‌كی گه‌وره‌..

---

رزقه وأمن الفتان" رواه مسلم عن سلمان.

"رباط يوم في سبيل الله خير من ألف يوم فيما سواه من المنازل" رواه الترمذي وقال حسن صحيح.

"عينان لا تمسهما النار: عين بكت من خشية الله، وعين باتت تحرس في سبيل الله" رواه الترمذي وقال حديث حسن. (وه‌رگێڕ)

هەروەها زیادەیەکی کەم لە چەقی تەوەرەدا - با بە ئەندازەی سەرەپەنجەیەکیش بێت - کاتی وا دەبێ لە بازنەکەی دەوری‌دا دەبێت بە یەك مەتری تەواو.

هەر بەم جۆرەیش، هاوەڵە بەرێزەکان، لەبەر ئەوەی دامەزرێنەری ئیسلام و رەگی درەختە رووناکەکەین و، سەرەتای هێڵە بنەڕەتی‌یەکانی بینای ئیسلام و، بناغە و پێشەوای کۆمەڵی ئیسلامین و، نزیکترین کەسن لە خۆری رووناکی "نبووەت" و چرای حەقیقەتەوە، ئەوا لەبەر هەموو ئەمانە، کردەوەیەکی کەمی ئەوان لە راستی‌دا تابلێی گەورەیە و، خزمەتگوزاری‌یەکی بچووك کە ئەوان پێشکەشی بکەن، یەکجار مەزن و زۆرە. کەواتە مومکین نی‌یە هیچ کەسێکیان پێ بگاتەوە، مەگەر کەسێك وەك ئەوان هاوەڵی پێغەمبەر بێت ﷺ!

اللّهم صل على سيدنا محمد الذي قال: "اصحابي كالنجوم بأيهم اقتديتم اهتديتم"[1] و "خير القرون قرني"[2] وعلى آله واصحابه وسلم.

**﴿سبحانك لا علمَ لنا إلا ما علَّمْتَنا إنك أنت العليم الحكيم﴾.**

* * *

**پرسیار:**

دەوترێ: هاوەڵە بەرێزەکان بە چاوی خۆیان پێغەمبەریان ﷺ دیوە، ئنجا ئیمانیان پێ هێناوە و تەسدیقیان کردووە. بەڵام ئێمە بێ ئەوەی بی‌بینین ئیمانمان پێ هێناوە. کەواتە ئیمانی ئێمە لە هی ئەوان بەهێزترە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە چەند ریوایەتێك هەن، پشتی ئەم بۆچوونەی ئێمە دەگرن!!

**وەڵام:**

هاوەڵە بەرێزەکان - خوای گەورە لە هەموویان رازی بێت - لە بەردەم تەوژمی هەموو بیروڕاکانی ئەو کاتەی جیهاندا، کە هەر هەموویان دوژمنی ئیسلام بوون و بەرەنگاریی

---

(١) رواه البيهقي واسنده الدَيلمي عن ابن عباس بلفظ: "اصحابي بمنـزلة النجوم في السماء.." بڕوانە: "كشف الخفاء"ی "عەجلوونی" ج١/ص١٣٢.

واورده الحافظ ابن حجر في المطالب برقم ٤١٩٣ وقال: اسناده ضعيف. قال المحقق: قال البوصيري: رواه ابن ابي عمر بسند ضعيف لضعف يزيد الرقاش والراوي عنه. وأورده بغير الألفاظ السابقة أيضا برقم ٤١٩٤، وقال الحافظ: ضعيف جدا. قال المحقق: "حمزة الجزري ضعيف جدا". وسكت عليه البوصيري.

وفي صحيح مسلم ٢٥٣١ عن ابي بريدة عن ابيه: أن النبي ﷺ قال: "النجوم أمنة للسماء، فاذا ذهبت النجوم أتى السماء ما توعد. وأنا أمنة لأصحابي، فاذا ذهبت أتى أصحابي ما يوعدون. وأصحابي أمنة لأمتي فاذا ذهب أصحابي أتى أمتي ما يوعدون". (وەرگێر - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی)

(٢) حديث: "خير الناس قرني ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم" متفق عليه عن ابن مسعود رضي الله عنه مرفوعاً.

ئیسلامیان ده‌كرد، ڕاوه‌ستابوون. ئه‌وان له‌م جۆره دۆخه‌دا ئیمانێكی جێگیر و دامه‌زراو و ڕاست و بێ گه‌ردیان به‌م ئایینه هێنا، كه جگه له ڕواڵه‌ته ئاشكرا مرۆڤانه‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ هیچی تریان لێ نه‌دیبوو، به‌ڵكو هه‌ندێ جار بێ ئه‌وه‌ی موعجیزه‌شی لێ ببینن ئیمانیان پێ ده‌هێنا. ئیمانه‌كه‌شیان ئه‌وه‌نده به‌هێز و دامه‌زراو بوو كه ئه‌و هه‌موو بیر و باوه‌ڕه گشتی‌یه‌ی دوژمنانی ئیسلام نه‌یانتوانی ئیمانیان جێ له‌ق بكه‌ن، به‌ڵكو هه‌ر نه‌یشیانتوانی كه‌مترین وه‌سوه‌سه و گومان له دڵیاندا دروست بكه‌ن.

به‌ڵام ئێوه، بیروباوه‌ڕی جیهانی ئیسلام پشتی ئیمانه‌كه‌تان ده‌گرێت و یاریده‌تان ده‌دات. سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه ئێوه به چاوی "ژیری" كه‌سێتیی مه‌عنه‌ویی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره به‌ڕێزه ﷺ ده‌بینن، كه به نووری ئیسلام و ڕاستی‌یه‌كانی قورئان ڕوون بووه‌ته‌وه. ئه‌و كه‌سێتی‌یه‌ی كه به‌هۆی هه‌زار موعجیزه‌ی بێ گومانی خۆی، بووه به كه‌سێتی‌یه‌كی به‌سام و هه‌یبه‌ت و شكۆدار. جا ئێوه دوای هه‌موو ئه‌مانه ئیمانتان به‌م پێغه‌مبه‌ره هێناوه، هه‌رچه‌نده‌ش ڕووی ڕووناك و كه‌سێتیی مرۆڤانه‌ی ئه‌وتان به چاو نه‌دیوه، كه له جێی تۆوی دره‌ختی تووبای نبووه‌تدایه.

ئایا ئه‌م ئیمانه‌ی ئێوه له‌گه‌ڵ ئه‌و ئیمانه مه‌زنه‌ی ئه‌واندا به‌راورد ده‌كرێت؟

ئه‌م ئیمانه‌ی ئێوه به ته‌نها قسه و وه‌سوه‌سه‌یه‌ك كه فه‌یله‌سووفێكی ماددیی ئه‌ورووپایی فڕێی بدات، یه‌كسه‌ر ده‌كه‌وێته داوی گومانه‌وه! جا ئه‌مه له كوێ و ئه‌و ئیمانه‌ی ئه‌وانیش له كوێ كه وه‌ك چیایه‌كی سه‌ختی دامه‌زراوی بڵندی ئه‌وتۆ وایه له به‌رده‌م ئه‌و گه‌رده‌لوولانه‌ی هه‌موو ئه‌هلی كوفر و ئیلحاد و جووله‌كه و گاور و فه‌یله‌سووفه‌كانی ئه‌هلی كوفری ئه‌وسا هه‌ڵیان ده‌كرد و ده‌یان ورووژاند، نه‌جووڵا و هه‌رگیز جێی پێ له‌ق نه‌بوو؟

ئه‌ی ئه‌و كه‌سه‌ی كه ئه‌م لافه لێ ده‌دات!

ئیمانی لاوازی تۆ، كه جاری وا هه‌یه ناتوانێت به ته‌واوی فه‌رزه‌كان به‌جێ بهێنێت، له كوێ له‌گه‌ڵ ئیمان و ته‌قوای گه‌وره و چاكه‌كاری‌یه‌كانی ئه‌واندا به‌راورد ده‌كرێت كه گه‌یشتووه‌ته پله‌ی "ئیحسان"؟

ئه‌و ڕیوایه‌ته‌ش كه له هه‌ندێ فه‌رمووده‌ی پیرۆزدا به‌م واتایه هاتووه ده‌فه‌رموێت: "ئه‌وانه‌ی نه‌یاندیوم و ئیمانیان پێ هێناوم، له ئێوه چاكترن"[1]، سه‌باره‌ت به فه‌زائیلی

(١) له‌وانه‌یه مه‌به‌ست ئه‌م فه‌رمووده‌یه بێت: "وددت أني قد رأيت إخواننا، قالوا: يا رسول الله ألسنا إخوانك؟ قال: بل أنتم أصحابي، وإخواني الذين لم يأتوا بعد.."الخ رواه مسلم والنسائي وأحمد وابن ماجه والإمام مالك، كلهم عن أبي هريرة رضي الله عنه. (وه‌رگێڕ – له چاپه عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌وه)

تایبەتی و لە بارەی هەندێ کەسەوەیە. ئەم باسەی ئێمەش لە بارەی فەزائیلی گشتی‌یەوەیە و سەبارەت بەو شتانە دەدوێت کە دەگەڕێنەوە بۆ زۆربەی خەڵکی.

**پرسیاری دووهەم:**

دەڵێن: ئەولیا و پیاوچاك و خاوەن کەماڵەکان، بەپێی ناوەرۆکی فەرموودەی: "حب الدنيا رأس كل خطيئة"(١) وازیان لە دنیا و هەرچی‌یەکی تێدایە هێناوە. بەڵام هاوەڵە بەڕێزەکان ڕوویان لە دنیا بووە و دەستیان تێکەڵی کاروبارەکانی کردووە و وازیان لێ نەهێناوە. تەنانەت هەندێکیان لە ئەهلی شارستانێتی زیاتر پێداویستی‌یەکانی دنیایان بەکارهێناوە. ئیتر چۆن دەڵێیت: بچووکترین هاوەڵی وەك ئەوانە، وەك گەورەترین وەلی وایە؟

**وەڵام:**

لە "هەڵوێستی دووهەم و سێ‌هەمی وتەی سی و دووهەم"دا بە شێوەکی بێ گومان چەسپاندوومانە کە:

دنیا سێ ڕووی هەیە (ڕوویەکیان ڕووەو ناوە جوانەکانی خوای گەورەیە و، یەکێکی تریان کێڵگەی ئاخیرەتە و، سێ‌هەمیان ڕووەو ئارەزوو و داخوازی‌یەکانی نەفس دەڕوانێت)..

جا دەربڕینی خۆشەویستی بۆ ئەو دوو ڕووەی کە بەرەو ناوە جوانەکان و، قیامەت دەڕوانن، لە خواپەرستیی مرۆڤ کەم ناکاتەوە. بەڵکو هۆی کەماڵی مرۆڤە و مایەی بەرزیی ئیمانەکەیەتی. چونکە مرۆڤ تاکو لە خۆشەویستیی ئەو دوو ڕووەدا زیاتر خۆی ماندوو بکات، پەرستنی پتر و خواناسیی زیاتری دەست دەکەوێت.

ئا لێرەوەیە کە دنیای هاوەڵە بەڕێزەکان ڕووەو ئەو دوو ڕووەی دنیا بووە و، بەم پێیە دنیایان بە کێڵگەی قیامەت داناوە و چاکەیان تێدا چاندووە و، دروێنەی بەروبوومی پێگەیشتوو و پاداشتی گەورە و زۆریان بۆ ئەو دنیایان لێ چنیوە. هەروەها دنیا و هەموو شتێکی ناو دنیایان وەك ئاوێنەیەك داناوە کە ڕووناکیی درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورەیان تێدا بەدی کردووە. ئەوان بەم جۆرە سەیری دنیایان دەکرد و بە وردی سەرنجیان لێ دەدا و بەوپەڕی شەوق و تاسەوە بیریان لە هەموو لایەنێکی دەکردەوە. بەم کارەش زیاتر لە خوای گەورەوە نزیك دەبوونەوە.. لە هەمان کاتدا وازیان لە ڕووی

---

(١) رواه البيهقي في شعب الايمان مرسلا ورمز السيوطي لضعفه. انظر تفصيل ذلك في كشف الخفاء (ت١٠٩٩). وردت أحاديث في ذم الدنيا. منها "الدنيا ملعونة ملعون مافيها إلاّ ما ابتغي به وجه الله" رواه الطبراني باسناد لابأس به. وصححه محقق (الترغيب والترهيب ١/٦).

سێهه‌می دنیا هێنا، كه‌ ئه‌و ڕووه‌ چه‌په‌ڵ و له‌ناوچووه‌یه‌تی ڕووه‌و ئاره‌زووه‌كانی مرۆڤ ده‌ڕوانێت.

**پرسیاری سێهه‌م:**

ته‌ریقه‌ته‌ سۆفی‌یه‌كان ڕێگای گه‌یشتنن به‌ ڕاستی‌یه‌كان. به‌ناوبانگتر و به‌رزترینیان ته‌ریقه‌تی نه‌قشبه‌ندی‌یه‌، كه‌ به‌ جاده‌ی هه‌ره‌ گه‌وره‌ داده‌نرێت. هه‌ندێ له‌ ئه‌قتابه‌كانیشی ده‌ستووره‌كانی ئه‌م ته‌ریقه‌ته‌یان به‌م جۆره‌ كورت كردووه‌ته‌وه‌ كه‌ فه‌رموویانه‌:

در طريق نقشبندى لازم آمد چار ترك    ترك دنيا، ترك عقبى، ترك هستى، ترك ترك

واته‌: له‌ ته‌ریقه‌تی نه‌قشبه‌ندی‌دا مرۆڤ ده‌بێ ته‌ركی چوار شت بكات: "ته‌ركی دنیا". واته‌ دنیا نه‌كات به‌ ئامانج و مه‌به‌ست. دووهه‌م: "ته‌ركی ئاخیره‌ت به‌ حسابی نه‌فس" واته‌: مه‌به‌ستی ده‌ستكه‌وتنی ئاخیره‌تیش نه‌بێت، بۆ هێنانه‌دیی خواسته‌كانی ده‌روون. هه‌روه‌ها "ته‌ركی نه‌فس" به‌وه‌ی كه‌ نه‌فس له‌ بیر ببرێته‌وه‌. پاشان "ته‌ركی ته‌رك" واته‌: هه‌ر بیر له‌م ته‌رك كردنه‌ش نه‌كاته‌وه‌، بۆ ئه‌وه‌ی دووچاری خۆ به‌گه‌وره‌زانین و له‌خۆ بایی بوون نه‌بێت!

خۆ ئه‌وه‌تا گه‌یشتن به‌ ناسینی ڕاسته‌قینه‌ی خوا و كه‌مالاّتی ڕاسته‌قینه‌ی مرۆڤانه‌، ته‌نها به‌ ته‌رك كردن و وازهێنان له‌ غه‌یری خوا ده‌بێت.. ئایا ئه‌مه‌ وا نی‌یه‌؟

**وه‌لاّم:**

ئه‌گه‌ر مرۆڤ ته‌نها (دڵ) بوایه‌ و هیچی تری نه‌بوایه‌، ئه‌وا پێویستی ده‌كرد وازی له‌ غه‌یری خوا، ته‌نانه‌ت له‌ سیفه‌ت و ناوه‌كانیشی بهێنایه‌ و (دڵ)ی ته‌نها په‌یوه‌ستی زاتی خوای گه‌وره‌ بكردایه‌. به‌ڵام خۆ مرۆڤ له‌طائیفی (دڵ)ئاسای زۆری هه‌یه‌، وه‌كو عه‌قڵ و، ڕۆح و، سیڕ. هه‌ریه‌ك له‌م له‌طائیفانه‌ش كار و فه‌رمانبه‌ری‌یه‌كی تایبه‌تیی پێ سپێرراوه‌ كه‌ ده‌بێ ئه‌نجامی بدات.

مرۆڤی كامڵ ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ به‌ وێنه‌ی هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كان سه‌رجه‌می ئه‌و له‌طائیفانه‌ ڕووه‌و ئامانجه‌ سه‌ره‌كی‌یه‌كانیان، كه‌ بریتی‌یه‌ له‌ خواپه‌رستی، ئاراسته‌ بكات. به‌م جۆره‌، (دڵ) وه‌كو پێشه‌وایه‌ك وایه‌ سه‌ركرده‌یی ئه‌و له‌طائیفانه‌ی له‌ ئه‌ستۆدایه‌ و، هه‌ریه‌كه‌یان له‌ ڕێگای به‌ندایه‌تیی تایبه‌تیی خۆیه‌وه‌ ڕووه‌و حه‌قیقه‌ت ئاراسته‌ و به‌ڕێ ده‌كات. ئه‌و كاته‌ دڵ سه‌رپه‌رشتی و پێشه‌وایی له‌طائیفه‌كان ده‌كات و، سه‌رباز له‌ مه‌شقدا چۆنه‌، به‌و شێوه‌یه‌ له‌ مه‌یدانێكی به‌ریندا ده‌یانخاته‌ كار و به‌ڕێیان ده‌كات. وه‌ك ئه‌و حاڵه‌ته‌ی كه‌ هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كانی له‌سه‌ر بووه‌.

دەنا وازهێنانی (دڵ) لە سەربازەكانی و، هەوڵدان بۆ ڕزگار كردنی تەنها خۆی، كارێكە مایەی شانازی نییە، بەڵكو تەنها ئەنجامی ناچارییە!

**پرسیاری چوارەم:**

لافی (چاكتری) بەرامبەر بە هاوەڵەكان لە كوێوە پەیدا دەبێت؟ ئەوانە كێن ئەم لاف لێدانە دەورووژێنن؟ بۆچی لەم سەردەمەی ئێستاماندا ئەم چەشنە مەسەلانە دەهەژێنرێن؟ لە كوێ لافی گەیشتن بە پلەی موجتەهیدە پایەبەرزەكان سەرهەڵدەدات؟

**وەڵام:**

ئەوانەی كە ئەم جۆرە مەسەلانە دەڵێن، دوو بەشن. بەشێكیان: هەندێ فەرموودەی پیرۆزیان دی و بڵاویان كردەوە، بەو نیازەی كە شەوقی خاوەن تەقوا و چاكەكارانی ئەم سەردەمە هان بدەن و بەرەو ئایین پاڵیان پێوە بنێن. ئەم جۆرە كەسانە خاوەنی ئایین و زانست و ئیخلاسن. سەبارەت بەوان هیچ قسەیەكمان نییە و، ئەوانە كەمن و بە زوویی بێدار دەبنەوە.

بەڵام بەشەكەی تریان: چەند كەسێكی زۆر لەخۆ بایین و تابلێی لە خۆیان ڕازین، دەیانەوێت بە ناوی لاف لێدانی ئەوەی كە گوایا لە ئاستی موجتەهیدە گەورەكاندان، خۆدارنینیان لە مەزهەبە فیقهییەكان ئاشكرا بكەن! تەنانەت دەیانەوێت ئیلحادەكەیان و داماڵینی ئایین لە ئەستۆی خۆیان لە ڕێی ئەو لاف لێدانەوە بەرێ بكەن، كە گوایا لە ئاستی هاوەڵە بەرێزەكاندان.. جا ئەو گومڕایانە:

یەكەم: كەوتوونەتە هەڵدێری ڕووەو كەندەڵان و شیوی هەرزەیی(سفاهة)یەوە! بە ڕادەیەك كە وایان لێ هاتووە لەگەڵ هەرزەییدا ڕاهاتوون و ناتوانن وازی لێ بهێنن و داواكارییەكانی شەرع ئەنجام بدەن كە لە هەرزەیی دووریان دەخاتەوە. دەبینیت هی وایان هەیە بەهانە بۆ خۆی بەوە دەهێنێتەوە كە دەڵێت: (ئەم مەسەلانە چەند مەسەلەیەكی ئیجتیهادین و، مەزهەبە فیقهییەكان لەم چەشنە مەسەلانەدا لەناو خۆیاندا جیاجیان، ئەوان پیاو بوون ئیجتیهادیان كردووە و، ئێمەش وەك ئەوان پیاوین دەتوانین ئیجتیهاد بكەین. لەوانەیە وەك چۆن ئێمە دەكەوینە هەڵەوە، ئەوانیش بكەونە هەڵەوە. لەبەر ئەوە، عیبادەتەكانمان بەو شێوەیەی خۆمان بە دڵمانە ئەنجامیان دەدەین. واتە: خۆمان بە ناچار نازانین كە شوێنی ئەوان بكەوین)!!

ئه‌و داماوانه‌، به‌م فێڵه‌ی شه‌یتان، مه‌زهه‌به‌كان له‌ ئه‌ستۆی خۆیان داده‌ماڵن، كه‌ فێڵێكی تابلێیی لاواز و به‌هانه‌یه‌كی تابلێیی بێبایه‌خه‌. وه‌ك له‌ په‌یامی ئیجتیهاددا چه‌سپاندوومانه‌.

دووهه‌م: ئه‌وانه‌ كاتێ كه‌ بۆیان ده‌ركه‌وت فێڵه‌كه‌یان له‌ سنووری ده‌مدرێژی كردندا به‌رامبه‌ر به‌ موجته‌هیده‌ گه‌وره‌كان ته‌واو نابێت، ده‌ستیان كرد به‌ ده‌مدرێژی بۆ سه‌ر هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كانیش، خوایان لێ ڕازی بێت. چونكه‌ بۆیان ده‌ركه‌وت كه‌ موجته‌هیده‌كان ته‌نها كاروباری (نه‌زه‌ریاتی ئایینی)یان له‌ ئه‌ستۆدایه‌. كه‌چی ئه‌مان ده‌یانه‌وێت (زه‌رووریاتی ئایینی) بڕووخێنن و به‌ یه‌كجاری بیگۆڕن! له‌به‌ر ئه‌وه‌ ئه‌گه‌ر بڵێن: (ئێمه‌ له‌ موجته‌هیده‌كان مه‌زنترین)، كاره‌كه‌یان ته‌واو نابێت. چونكه‌ مه‌یدانی كاروباری موجته‌هیده‌كان سه‌یر كردن و ڕوانینه‌ له‌ مه‌سه‌له‌ فه‌رعی‌یه‌كان، نه‌ك "ده‌قه‌ شه‌رعی‌یه‌كان". له‌به‌ر ئه‌وه‌، ده‌بینیت ئه‌وان دوای ئه‌وه‌ی له‌ مه‌زهه‌به‌كان خۆیان داده‌ماڵن، ده‌ست ده‌كه‌ن به‌ ده‌مدرێژی بۆ سه‌ر هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كان، كه‌ هه‌ڵگری "زه‌رووریاتی ئاینن"!

به‌ڵام ئه‌وانه‌ خه‌یاڵیان خاوه‌! چونكه‌ نه‌ك هه‌ر ئه‌م چه‌شنه‌ ئاژه‌ڵانه‌ی كه‌ له‌ سه‌ر شێوه‌ی مرۆڤن، به‌ڵكو مرۆڤی ڕاسته‌قینه‌ش، ته‌نانه‌ت مرۆڤه‌ ڕاسته‌قینه‌ كامڵه‌كانیش، كه‌ گه‌وره‌ پیاوانی ئه‌ولیا و پیاوچاكانن، هه‌رگیز ناتوانن لافی هاوچه‌شنیی بچووكترین هاوه‌ڵی به‌ڕێز لێ بده‌ن. وه‌ك له‌ په‌یامی ئیجتیهاددا چه‌سپاندمان.

اللهم صل وسلم على رسولك الذي قال: "لاتسبُّوا أصحابي لاتسبوا أصحابي، فوالذي نفسي بيده لو أن أحدكم أنفق مثل أُحدٍ ذهبا ما أدركَ مُدَّ أحدِهم ولانصيفه"[1].

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

(١) رواه البخاري ومسلم وابو داود والترمذي والنسائي وابن ماجة بالفاظ متقاربة.
واته‌: جوێن به‌ هاوه‌ڵه‌كانم مه‌ده‌ن، جوێن به‌ هاوه‌ڵه‌كانم مه‌ده‌ن، به‌و خوایه‌ی گیانی منی به‌ ده‌سته‌ ئه‌گه‌ر هه‌ر یه‌كێك له‌ ئێوه‌ به‌ ئه‌ندازه‌ی چیای ئوحود زێڕ له‌ ڕێی خوادا ببه‌خشێت هێشتا پاداشته‌كه‌ی ناگاته‌ پاداشتی مشتێك یان نیو مشت به‌خشینی ئه‌وان. (وه‌رگێڕ)

# وتەی بیست و هەشتەم

**(ئەم وتەیە تایبەتە بە باسی بەهەشتەوە و، بریتی‌یە لە دوو مەقام. مەقامی یەکەم ئاماژە بۆ هەندێ نەرمونیانی و ناسکۆڵەیی بەهەشت دەکات و، مەقامی دووهەمیش بە زمانی عەرەبی‌یە و[1] پوختە و بناغەی وتەی دەهەمە و، بە دوازدە ڕاستیی گومانبڕی یەك لە دوای یەك و بە چەشنێکی ڕوون و بێ گومان بوونی بەهەشتی تێدا چەسپێنراوە. لەبەر ئەوە، لێرەدا لە بارەی چەسپاندنی بوونی بەهەشتەوە نادوێین، بەڵکو تەنها قسە لە چەند پرسیار و وەڵامێك دەکەین سەبارەت بە هەندێ حاڵەتی بەهەشت کە ڕەخنەیان ئاراستە دەکرێت. پشت بەخوا وتەیەکی گرنگیش لە بارەی ئەو ڕاستی‌یە هەرە مەزنەوە دەنووسرێت).**

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَبَشِّرِ الَّذينَ آمَنُوا وَ عَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقاً قَالُوا هذا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهاً وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (البقرة:٢٥)

**"ئەمانە پوختە وەڵامی هەندێ پرسیارن لە بارەی بەهەشتی هەمیشەیی‌یەوە"**

ئەو ئایەتانەی قورئان کە تایبەتن بە بەهەشتەوە، گەلێ لە بەهەشت جوانترن و، لە حۆری‌یەکانی ناسکترن و، لە سەلسەبیلەکەشی شیرین و سازگار ترن. ئەو ئایەتانە هێندە ڕوونن کە بواری قسەی تر و ڕوونکردنەوەی زیاتریان نەهێشتووەتەوە.

لەبەر ئەوە، وا پلیکانەیەك دادەنێین تاکو ئەو ئایەتە ڕووناکە ئەزەلی و بەرز و جوانانە لە تێگەیشتنی مرۆڤ نزیك بخەینەوە. وا چەپکێك پرسیاری ناسکۆڵە باس دەکەین کە نموونەی گوڵزاری بەهەشتی قورئانن و، لە پێنج دانە هێما و لە نێوان چەند پرسیار و وەڵامێکدا ئاماژەیان بۆ دەکەین.

---

(١) ئەو مەقامە عەرەبی‌یە بریتی‌یە لە پەیامی (لاسيّمات) کە لە کتێبی: (المثنوي العربي النوري)دایە. (وەرگێڕ)

بەڵێ، هەروەك هەموو لەزەتە مەعنەوی‌یەكان لە بەهەشتدا هەن، گشت لەزەتە ماددی‌یە جیسمانی‌یەكانیش - بە هەمان جۆر - لە بەهەشتدا ئامادە كراون.

**پرسیار:**

جیسمانییەت(ماددییەت)ی كەم و كورت و ناتەواو و بگۆڕ و شلۆق و ئازاربەخش، چ پەیوەندی‌یەكی بە هەمیشەیی و بەهەشتەوە هەیە؟ مادەم گیان(ڕۆح) تام و لەزەتە بەرزەكانی بەهەشتی سەروزیادە، ئیتر چ پێویست بە حەشرێكی جیسمانی دەكات بۆ چەشتنی تامی لەزەتە جیسمانی‌یەكان؟

**وەڵام:**

"گڵ" هەرچەند لە چاو ئاو و هەوا و ڕووناكی‌دا چرو پڕ و تاریكە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا جێی سەرهەڵدان و پەیدا بوونی هەموو جۆرێكی بەدیهێنراوانی خوای گەورەیە. لەبەر ئەوە، لە ناوەرۆك و مەعنادا بەسەر هەموو توخمەكانی تردا بەرزترە و دارای بایەخێكی گرنگترە.. هەروەك "گڵ" وایە، "دەروونی مرۆڤ"یش بە هەمان جۆرە، چونكە هەرچەند شتێكی چڕ و پڕە، بەڵام بەسەر هەموو لایەنە ناسكەكانی تری مرۆڤدا بەرز دەبێتەوە، بە بۆنەی ئەو هەمەكێتی(جامعية)یەی كە تیایدایە، بە مەرجێك پاكژ كرابێت.

"جیسمانییەت"یش وەهایە، هەمەكی‌ترین ئاوێنەی درەوشانەوە و ڕەنگدانەوەی ناوەكانی خوای گەورەیە و، لە هەرهەموویان گشتگیرتر و بەپیت و دەوڵەمەندترە. چونكە ئەو ئامێرانەی كە دەتوانن سەرجەمی پاشەكەوت كراوەكانی گەنجینەكانی میهرەبانیی خوای گەورە بخەملێنن و هەڵیان بسەنگێنن، تەنها لە جیسمانی‌دان. ئەوەتا - بۆ نموونە - ئەو هەستی چەشتنەی كە لە زماندایە، گەر بە ئەندازەی ژمارەی هەموو خواردەمەنی‌یەكان ئامێری تێدا نەبوایە بۆ چەشتنی ڕۆزی، ئەوا هەرگیز ئەو هەستە بەو هەموو خواردەمەنی‌یانەی نەدەزانی و لە جیاوازیی نێوانیان شارەزا نەدەبوو و، نەیدەتوانی لێكیان جیا بكاتەوە..

هەروەها ئامێرەكانی ناسینی زۆربەی ناوە جوانە درەخشانەكانی خوای گەورە و، هەست پێ كردنیان و، چەشتنیان، تەنها لە جیسمانی‌دان..

هەروەها ئەو لێهاتن و قابیلییەتانەی كە دەتوانن هەست بە چەندین تام و لەزەت و جۆری بێ‌سنوور و بێ‌كۆتایی بكەن، تەنها لە جیسمانی‌دان.

لەمەوە بەوپەڕی بێ‌گومانی تێ‌دەگەین - وەك لە وتەی یازدەهەمدا چەسپاندمان - كە: بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرانە دەیەوێت بەم بوونەوەرانەی:

گشت گەنجینەكانی "میهرەبانیی خۆی" بە خاوەن هەستان بناسێنێت..

لە هەموو درەوشانەوەكانی ناوە جوانەكانی خۆی تێیان‌بگەیەنێت..

تامی گشت جۆرەكانی نیعمەت و بەخششەكانی خۆی بەوان بچێژێت.

هەموو ئەمانەش لە ڕێی:

ڕەوتـی ئـەم بوونەوەرانـە و، جۆرەکـانی هەڵسـوکەوت کـردن تیایـاندا و.. گشـتی و هەمەکیبوونی توانایی و لێهاتنەکانی مرۆڤەوە.

کەواتـە دەبێ حـەوزێك ببێـت لافـاوی مـەزنی ئـەم بوونەوەرانـەی تێـدا ڕۆ بکرێـت و.. پیشانگایەك ببێت هەموو ئەو شتانەی تێدا پیشـان بدرێـن کـە لـە کارگـەی ئەم بوونەوەرانەدا دروسـت کـراون و.. پێویسـت دەکـات عـەمبار و گەنجینەیـەکی هەمیشـەیی ببێـت، تـاکو داهاتەکانی ئەم کێڵگەیەی دنیای تێدا هەڵبگیرێت.

واتـە: دەبێ خانەیـەکی بەختـەوەری هـەبێت کـە تـا ڕادەیـەك لـەم بوونەوەرانـە بچێـت و، پارێزگاریی هەموو بناغە جیسـمانی و ڕۆحانییەکان بکات. هەروەهـا دەبێ ئـەو بەدیهێنـەرە دانـا و دادگەر و میهرەبانە چەند لـەزەتێکی تایبـەتی بـەو ئامێرە جیسـمانییانە ببەخشێت لـە پاداشتی کار و خزمەتگوزاری و پەرستشە تایبەتییەکانیاندا. دەنا – واتە گـەر وا نـەبێت و بـە پێچەوانـەی ئەمـەوە بێـت – بـارێکی ئەوتۆ دێتەکایـەوە کـە بـە تـەواوی پێچەوانـەی دانـایی و دادگەری و میهرەبانیی خواوەنـد دەبێـت. کـە ئەمـەش هـەرگیز لەگـەڵ جوانیـی میـهرەبانی و کەماڵی دادگەریی ئەودا ناگونجێت و، خواوەند گەلـێ بـەرز و بڵندترە لـەوەی کـە ئەو بـارە نەگونجاوە بەدی بهێنێت.

**پرسیار:**

بەشـەکانی جەستەی زینـدەوەر هەمیشـە لـە پێکـهاتن و هەڵوەشـانەوەی بـەردەوامدان و، گرفتـاری نـەمان دەبـن و سـیفەتی هەمیشـەییان دەسـت ناکـەوێت. ئنجـا خـواردن و خواردنەوەش بۆ مانەوەی خودی مرۆڤ و، تێکەڵبوونیشی لەگەڵ هاوسەریدا بۆ مەبەستی مانەوەی جۆری مرۆڤە. ئەم شـتانەش لـەم جیهانـەدا سـەرەکی و بنچینـەیین. بـەڵام لـە جیـهانی هەمیشـەیی ئـەودنیادا هیـچ پێویستییەك بەمانـە نـامێنێت. ئیـتر بۆچـی لـە نێـوان لەزەتـەکانی بەهەشتی مەزندا دانراون؟

**وەڵام:**

هـۆی نـەمان و مردنـی جەستەی زیندەوەر لـەم جیهانـەدا دەگەڕێتـەوە بـۆ ناتـەبایی و نـا هاوسەنگیی داهات و خەرجییەکانی ئەو لەشە (واتە لە نێوان ئەوەی تێـی دەچێـت و ئـەوەش بـەکاری دەهێنێـت) چونکـە لـە منالییـەوە تـا تەمـەنی کـامڵ بـوون داهـات و دەستکەوتەکان زۆرن، بەڵام پاش ئەو تەمەنە بەکاربردن زیـاد دەبێـت. لـە ئـەنجامی ئەمەشـەوە هاوسـەنگییەکە تیادەچێت و پاشان زیندەوەرەکە دەمرێت.

بەڵام لە جیهانی هەمیشەییدا، هەموو گەردیلەکان وەك خۆیان دەمێننەوە و دووچاری : پێکهاتن و هەڵوەشانەوە نابن. یان هاوسەنگییەکە وەك خۆی دەمێنێت و لەنگ نابێت و، بەردەوام و تەواو دەبێت لە نێوان دەرامەت و خەرجییەکاندا[1].

ئنجا جەستەش - لەوێ - هاودەم لەگەڵ کارکردنی کارگەی ژیانی جیسمانیدا، هەمیشەیی دەبێت، تاکو چەشتنی ئەو لەزەتانە وەك خۆی هەر بەردەوام بێت.

جا هەرچەند لەم دنیایەدا خواردن و خواردنەوە و تێکەڵیی هاوسەری ژیان، لە پێداویستییەوە پەیدا بوون و، ئەنجامەکەشیان بەجێهێنانی ئەرکێکی سەرشانە، لەگەڵ ئەوەشدا، چەندین لەزەتی شیرین و جۆراوجۆری ئەوتۆشیان ئاوێتە کراوە کە لە سەرووی هەموو لەزەتەکانی ترەوەن، ئەمەش پاداشتێکی پێشەکی و زووی ئەنجامدانی ئەو کار و ئەرکەی سەرشانە.

مادەم خواردن و خواردنەوە و تێکەڵیی هاوسەری ژیان لەم خانەی ئازارەدا تا ئەم ڕادەیە لەزەتی سەیر و جۆراوجۆریان گرتبێتە خۆ، ئەوا بێ هیچ گومانێك لە خانەی لەزەت و بەختەوەریدا، کە بەهەشتە، ئەو لەزەتانە چەندین شێوەی بەرز و بڵند دەگرنە خۆیان، سەرەڕای پاداشتی قیامەتیی ئەنجامدانی ئەرکەکانی دنیا کە ئەو لەزەتانە زیاتر دەکەن و، سەرباری لەزەتی ناسکی سەر بە ئیشتیهای دواڕۆژ خۆیشی، لە بریی پێویستییە دنیاییەکە، کە ئەویش لەزەتێکی زیادی ترە. بەم پێیە تام و چێژ و ناسکیی ئەو لەزەتانەی ئەوێ هەر لە زیادبووندا دەبن تا دەبنە لەزەتێکی گشتیی ئەوتۆ کە هەموو لەزەتەکانی تێدا کۆ دەبنەوە و، دەبن بە سەرچاوەیەکی بەخوڕی چەندین لەزەتی شیاوی بەهەشت و تەبا و گونجاو لەگەڵ سیفەتی هەمیشەیەتیی بەهەشتدا. چونکە ماددە بێ گیان و ژیان و هەستەکانی ئەم دنیا، لەو دنیا دەبن بە خاوەن هەست و ژیان، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزەی کە دەفەرموێ:

**﴿وَمَا هذِهِ الحَيَاةُ الدُّنْيَا إلاّ لَعِبٌ وَلَهْوٌ وإنَّ الدَّارَ الآخِـرةَ لَـهِيَ الحَيَـوانُ لَـوْ كَـانُوا يَعْلَمُونَ﴾**(العنكبوت: ٦٤).

---

(١) لەشی مرۆڤ و زیندەوەرانی ئەم دنیایە، وەك میوانخانەیەکی گەردیلەکان و، سەربازگە و قوتابخانەیەکی فێرکردن وایە بۆیان. چونکە گەردیلە بێ گیانەکان کە دەڕۆنە ناو ئەو لەشانەوە، شایستەیی ئەوە بەدەست دەهێنن کە ببن بە چەند گەردیلەیەك لە جیهانی زیندووی هەمیشەییدا، ئنجا لەو لەشە دەردەچن و بەجێی دەهێڵن. بەڵام لەو دنیادا ڕووناکیی ژیان گشتییە و هەموو شتێك دەگرێتەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿وإنَّ الدَّارَ الآخِـرَةَ لَهِيَ الحَيَوَانُ﴾**(العنكبوت: ٦٤) ئیتر گەردیلەکانی ئەوێ، بۆ مەبەستی ڕووناکبوونەوەیان، پێویستیان بەو سەفەر و ڕۆشتن و کار و تەعلیمات و مەشقانە نابێت. کەواتە لەودنیادا گەردیلەکان وەك خۆیان دەمێننەوە و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا نایەت. (دانەر)

درەختەکانی ئەوێ، بە چەشنی مرۆڤی ئێرە، لە فەرمانەکان تێدەگەن و جێبەجێیان دەکەن.. بەردەکانی ئەوێ وەك گیاندارانی ئێرە وان، گوێڕایەڵی فەرمانن. گەر لەوێ بە درەختێك بڵێیت: بەرێکی خۆتم بدەرێ، یەکسەر دەتداتێ.. گەر بە بەردێك بڵێی: وەرە بۆ ئێرە، دێت!

جا مادەم درەخت و بەردەکانی ئەوێ سیفەتی "پلەبەرزی"ی ئاوایان دەست بکەوێت، ئەوا بێ گومان خواردن و خواردنەوە و تێکەڵیی هاوسەر - لەوێ - چەندین شێوەی باڵا و بڵند دەگرنەخۆ، لەگەڵ پاریزگاری کردنی "ڕاستیی جەستەیی" خۆیان کە پلەیان لە چاو هی ئێرەدا بە ڕێژەی پلەبەرزیی بەهەشتە بەسەر دنیادا.

**پرسیار:**

دەشتەکییەك بۆ ماوەی یەك خولەك ئامادەی کۆڕی پێغەمبەر ﷺ دەبێت و، بەم ئامادەبوونەشی خۆشەویستیی پێغەمبەر ﷺ لەبەر خوا دەڕواتە ناو دڵیەوە، بەهۆی ئەو خۆشەویستییەشەوە لە بەهەشتدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەبێت، بەپێی ئەو فەرموودە پیرۆزەی کە دەفەرموێ: "المرءُ مَعَ مَنْ أحَبّ"(١)..

ئایا ئەو ڕێزنەی ڕووناکییە بێ کۆتاییەی دەست پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت چۆن لەگەڵ هی ئەو دەشتەکییەدا یەکاویەك دەردەچن؟

**وەڵام:** بە نموونەیەك ئاماژە بۆ ئەم ڕاستییە بەرزە دەکەین:

پیاوێکی مەزن، میواندارییەکی گەورە و گرنگی لە باخێکی پڕ لە گوڵزاری ڕەنگین و جواندا ساز کرد و، پیشانگایەکی لەوپەڕی ئارایشت و داهێنکاریدا ئامادە کرد، بە چەشنێك کە هەموو ئەو جۆرە خواردەمەنییانەی تێدا کۆکردبووەوە کە "هەستی چەشتن" هەستیان پێ دەکات و، گشت ئەو شتە جوانانەی تێدا دانابوو کە "هەستی بینین" پێی خۆشە و، هەموو ئەو شتە سەیر و نامۆیانەی تێدا بوو کە "هێزی ئەندێشە" بزوێنێت. بەم جۆرە، هەموو ئەو شتانەی لەو پیشانگایەدا کۆ کردەوە کە هەموو هەستە ئاشکرا و پەنهانەکان دڵنیا بکەن و مایەی ڕەزامەندییان بێت.

ئنجا دوو هاوڕێ بە یەکەوە ڕۆشتن بۆ ئەو میوانداریە و، لە شوێنێکی تایبەت و لەسەر یەك سفرەدا و لە تەنیشتی یەکترەوە دانیشتن. بەڵام یەکێکیان لەبەر ئەوەی هەستی چەشتنی

---

(١) رواه البخاري ومسلم وأحـــمد وابن حبان. (وەرگێڕ)

لاواز بوو، شتێكی كەم نەبێ لە تامی ئەو میوانداری‌یەی نەچەشت و.. بەهۆی ئەوەی بینایی كز بوو زۆر شتی نەبینی و.. لەبەر ئەوەش كە هەستی بۆنكردنی نەبوو، هەستی بە بۆنە خۆشەكانی ئەوێ نەدەكرد و.. لە وردەكاریی شتە لەعادەت بەدەرەكانیش تێنەگەیشت، چونكە نەیدەتوانی پەی بە لایەنە نامۆ و سەیرەكانی ئەو سنعەتانە ببات. واتە: ئەم یەكەیان سوودی لەو باخچە خەملاوە وەرنەگرت و، یەك لە هەزار بەڵكو یەك لە ملیۆنی ئەو شتانەی سەرخوانی میوانداری‌یەكە نەبێت تامی هیچی تری نەچەشت.

بەڵام ئەوی تریان، لەبەر ئەوەی هەموو هەستە دیار و پەنهانەكانی و، گشت لایەنە ناسكەكانی وەك: ژیری و دڵ و هەستەكانی تری، تێكڕا پێ گەیشتوو و كامڵ و كراوە بوون و، هەموو دەركەوتبوون، بە چەشنێك كە هەست بە هەموو وردەكاری‌یەكانی ئەو سنعەتانە بكات كە لەو پیشانگا ڕەنگینەدا ئامادە كرابوون و، بەو هەموو جوانی و نەرمونیانی و وردەكاری و شتە سەیرانەی ئەوێ بزانێت.. لەبەر ئەوە، بە تەواوی هەستی بە هەموویان كرد و تامی هەموویانی چەشت، هەرچەندەش لە تەنیشتی پیاوی یەكەمەوە دانیشتبوو!

جا ئەگەر ئەمە لەم دنیا شلۆق و بە ئازار و تەسكەدا ڕوو بدات و، جیاوازیی نێوان ئەو دوانەی تەنیشتی یەكتر بە ئەندازەی دووریی نێوان ئاسمان و زەوی بێت.. ئەوا دەبێ لەودنیای خانەی بەختەوەری و هەمیشەیی‌دا، هەموو كەسێك، بە چەشنێكی باشتر لەچاو دنیا، بەشی خۆی لە سفرە و خوانی خواوەندی بەسۆز و میهرەبان وەربگرێت و، بەپێی توانا و لێهاتنی خۆی هەست بە نیعمەتەكانی سەر ئەو سفرە و خوانە بكات، با لە تەنیشتی ئەو كەسەیشەوە بێت كە خۆشی دەوێت! چونكە بەهەشت ڕێ لەوە ناگرێت كە ئەو دوانە پێكەوە بن، با پلەشیان جیاواز بێت. لەبەر ئەوەی هەشت چینەكانی بەهەشت بەسەر یەكتری‌دا بەرزن، بەڵام عەرشی خواوەندی میهرەبان سەقفی هەموویانە[1]. چونكە ئەگەر لە دەوری چیایەكی قووچەكی، چەند خانوویەكی یەك لەناو یەك دروست بكرێن لە شێوەی چەند بازنەیەكدا كە دەوری چیاكەیان دابێت، ئەوا هەریەك لەو بازنانە لەوی تر بەرزتر دەبێت و بە سەرووی ئەوانی ترەوەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هیچیان ڕێ لەوە ناگرێت كە خۆریان لێوە ببینرێت. بەم پێیە، ڕووناكیی خۆر دەڕواتە ناو هەموو یەكێك لەو خانووانە.

---

(١) "الجنة مائة درجة، ما بين كل درجتين كما بين السماء والأرض، والفردوس أعلى الجنة، وفوقه عرش الرحمن". صحيح، رواه ابن ماجه والحاكم وابن عساكر. بڕوانە: (صحيح الجامع الصغير وزيادته ٣١١٦). (وەرگێڕ)

بەهەشتەکانیش - تا ڕادەیەك - لەم نموونەیە دەچن، بە گوێرەی ئەو تێگەیشتنەی کە مرۆڤ لە فەرموودە پیرۆزەکانەوە پەیی پێ دەبات.

**پرسیار:**

لە چەندین فەرموودەی پیرۆزدا ئەم واتایە هاتووە کە:

ژنانی بەهەشت لە پشت حەفتا دەست پۆشاك و کراسەوە مۆخی قاچیان دەبینرێت(۱)!

جا ئایا واتا و مەبەستی ئەم فەرموودەیە چی‌یە؟ چۆن ئەمە بە جوانی دادەنرێت؟

**وەڵام:**

واتاکەی گەلێ جوانە، تەنانەت لەوپەڕی جوانی و ناسکی‌دایە. چونکە:

لەم دنیا ناشیرین و مردووەدا، کە زۆربەی شتەکانی ناوی ڕووکەش و توێکڵن، هەرچی لە بەردەمی چاودا جوان دەربکەوێت و، ڕێ لەوە نەگرێت کە مرۆڤ لەگەڵی ڕابێت، ئەوا بە جوان دادەنرێت..

بەڵام لەو بەهەشتەدا. کە خۆی لە خۆی‌دا جوان و ڕەنگین و زیندووە و، تێکڕا کاکڵەی بێ توێکڵە، هەموو هەستەکانی مرۆڤ - چەشنی بینین - و گشت لایەنە هەستیارە ناسکەکانی، هەریەکەیان داواکاری وەرگرتنی بەش و لەزەتی جیاجیا و تایبەتیی خۆیانن لە "حۆری‌یەکان" و "ژنە دنیایی‌یەکانی ئەهلی بەهەشت" کە ئەمانەیان گەلێ لە حۆری‌یەکان جوانترن.

واتە: ئەم فەرموودە پیرۆزە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەر لە سەرووترینی چینەکانی جوانیی بەرگ و پۆشاکیان، تا دەگاتە مۆخی ناو ئێسکەکانی قاچیان، هەریەکەیان هەستێکی دیاریکراو و لایەنێکی هەستیاری تایبەتیی خەڵکی بەهەشت تێر دەکەن و، بەهەشتی‌یان لەزەتیان لێ دەچێژن.

بەڵێ، ئەم فەرموودەیە بە دەستەواژەی: "على كلّ زوجةٍ سبعون حُلّةً يُرى مخ سوقِها..." ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە:

"حۆری"ی بەهەشت دارای هەموو جۆرەکانی ئارایشت و جوانیی ماددی و مەعنەوین، لەوانەی کە دەبنە مایەی ڕەزامەندی و تێرکردنی گشت هەست و نەست و هێز و لایەنە ناسکە عاشقەکانی جوانی کە لە مرۆڤدان و حەزیان لەو چێژانەیە و تاسەمەند و شەیدای ئارایشت و جوانین. بەو واتایەی کە هەریەك لە حۆری‌یەکانی بەهەشت حەفتا جۆر لە بەشەکانی جوانیی بەهەشت دەپۆشن، بێ ئەوەی هیچیان ئەوانی تر داپۆشێت و ڕێ لە بینینی

---

(۱) لەم بارەوە فەرموودە زۆرە، وەك: "لكل واحد منهم زوجتان من الحور العين على كل زوجة سبعون حلة يرى مخ سوقهما من وراء لحومهما وحللهما كما يرى الشراب الأحمر من الزجاجة البيضاء" رواه الطبراني باسناد صحيح والبيهقي باسناد حسن. وراه البخاري ومسلم بنحوه. (وەرگێڕ)

جوانی‌یان بگرێت، چونكه له جۆر و چه‌شنی یه‌كتر نین. به‌ڵكو به خۆیان و له‌شولاریان زیاتر له حه‌فتا پله‌ی جۆراوجۆری جوانی ده‌رده‌خه‌ن، به ڕاده‌یه‌ك كه به ڕاستی و ته‌واوی ئاماژه‌ی ئه‌م ئایه‌ته‌ی تێدا ده‌رده‌خه‌ن كه ده‌فه‌رموێ:

﴿وَفِيهَا ما تَشْتَهِيهِ الأَنْفُسُ وَتَلَذُّ الأَعْيُنُ﴾ (الزخرف:٧١).

پاشان ئه‌م فه‌رمووده پیرۆزه ئه‌وه‌ش ڕوون ده‌كاته‌وه كه:

سه‌رنشینانی به‌هه‌شت پاشه‌ڕۆی ئه‌نجامی خواردن و خواردنه‌وه‌یان نی‌یه، چونكه هیچ مادده‌یه‌كی توێكڵ ئاسا له به‌هه‌شتدا نی‌یه كه پێویست نه‌بێت.

به‌ڵێ، مادەم له‌م دنیا نزمه‌دا، دره‌خته‌كان - كه له نزمترین پله‌ی گیانداری‌دان - سه‌رباری خۆراكی زۆر و زه‌به‌نده‌یان، كه‌چی پاشه‌ڕۆیان نه‌بێ، ئه‌ی بۆ ده‌بێ كه‌سانی ناو چینه به‌رزه‌كان، كه به‌هه‌شتی‌یانن، بێ پاشه‌ڕۆ نه‌بن؟

**پرسیار:**

له چه‌ند فه‌رمووده‌یه‌كی پیرۆزی پێغه‌مبه‌ردا ﷺ ئه‌م واتایه هاتووه كه:

هه‌ندێ كه‌س له به‌هه‌شتی‌یان موڵكێكی ئه‌وه‌نده‌ی هه‌موو دنیا و، سه‌دان هه‌زار كۆشك و ته‌لار و، سه‌دان هه‌زار حۆریی پێ ده‌به‌خشرێت..

ئایا ته‌نها یه‌ك پیاو ئه‌م هه‌موو شته زۆرانه‌ی بۆ چی‌یه و چ پێویستی‌یه‌كی پێیانه؟

ئه‌مه چۆن ڕوو ده‌دات؟ واتای ئه‌م فه‌رموودانه چی‌یه؟

**وه‌ڵام:**

ئه‌گه‌ر مرۆڤ له‌شێكی بێ گیان بوایه..

یان ته‌نها به‌دیهاتوویه‌كی ڕووه‌كی بوایه و بریتی بوایه له ته‌نها "گه‌ده" و به‌س..

یاخود ته‌نها له‌شێكی گیاندار و، جه‌سته‌یه‌كی كاتی و ساكار و قورس و سنووردار(مقيد) بوایه..

ئه‌وا ئه‌و هه‌موو كۆشك و ته‌لار و حۆری‌یه زۆرانه‌ی نه‌ده‌درایێ و شایانیان نه‌ده‌بوو..

به‌ڵام مرۆڤ یه‌كێكه له موعجیزه ئاشكراكانی خوای گه‌وره، به ڕاده‌یه‌ك كه ئه‌گه‌ر هه‌ر له‌م دنیا فانی و ته‌مه‌نه كورته‌دا هه‌رچی موڵك و سامان و له‌زه‌تی دنیایه بیدرێتێ، هێشتا هه‌ڵپه‌ی ئه‌و تێر ناكات. چونكه هه‌ندێ لایه‌نی ناسكی نادیاری مرۆڤ هه‌ن تێر نابن و پێویستی‌یان هه‌ر ده‌مێنێت.

مرۆڤ له‌م دنیایه‌دا وایه. به‌ڵام له‌ودنیای خانه‌ی به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشه‌یی‌دا، ئه‌م مرۆڤه‌ی كه خاوه‌نی چه‌ندین توانا و لێهاتنی نه‌بڕاوه‌یه، به زمانی پێداویستی‌یه له‌بن نه‌هاتووه‌كانی و.. به ده‌ستی ئاره‌زووه بێ سنووره‌كانی، له ده‌رگانه‌ی میهره‌بانی‌یه‌كی بێ كۆتایی ده‌دات. كه‌واته وه‌ك له‌و فه‌رمووده پیرۆزانه‌دا هاتووه، ئه‌وپه‌ڕی كارێكی ڕه‌وا و ژیرانه و ڕاسته كه ئه‌م

مرۆڤە لە بەهەشتدا بە چەندین چاکەکاریی ئاوا بێ کۆتایی و بێ‌سنوور لە لایەن خواوەندەوە بەهرەمەند بکرێت.

وا بەم شێوەیەی خوارەوە و بە دووربینی نموونەهێنانەوەیەك سەیری ئەم ڕاستی‌یە بەرزە دەکەین:

هەموو یەکێك لە باخەکانی "بارلا" بە چەشنی ئەم باخەی کە لەم شیوەدایە[1]، خاوەنی خۆیان هەیە. بەڵام هەرچی هەنگ و مەل و چۆلەکەش لە "بارلا"دایە دەتوانێت بڵێ: هەموو باخ و بێستانەکانی "بارلا" باخچە و سەیرانگە و مەیدانی هەڵسوکەوتی منن، هەرچەندەش مشتێك خۆراك سەروزیادیەتی! واتە هەموو "بارلا" بە موڵکی خۆی دادەنێت، ئەم بڕیارەشی ڕێ لەوە ناگرێت کە کەسانی تر لەو موڵکداری‌یەدا هاوبەشی بن.

مرۆڤیش - ئەوەی کە بە ڕاستی مرۆڤە - بۆی هەیە بڵێ: بەدیهێنەرم هەموو ئەم دنیایەی بۆ کردووم بە خانوو و، خۆر و ئەستێرەکانیش بە چرا و، زەوییش بە لانکێکی ئەوتۆ کە چەندین ڕایەخی بەنرخی ڕازاوە و ڕەنگینی تێدا ڕاخراوە. مرۆڤ ئەمە دەڵێت و، شوکرانەی پەروەردگاری خۆی لەسەر دەکات. ئەم بڕیارەشی ڕێ لەوە ناگرێت کە بەدیهێنراوانی تر لەم دنیایەدا هاوبەشی بن، بگرە ئەو بەدیهێنراوانە دنیاکەی ئەم پتر دەڕازێننەوە و جوان و ئاوەدانی دەکەن.

جا ئەگەر مرۆڤ یان باڵندە بۆی هەبێت لە هەریەکێکی ئەم بازنە مەزنەدا هەڵسوکەوت بنوێنێت و، لەم دنیا تەسکەدا چەندین نیعمەتی مەزن بەدەست بهێنێت، چۆن ئەوە بە دوور دەزانرێت کە لەودنیای خانەی بەختەوەریی فراوان و هەمیشەییدا لە لایەن چاکەکاریی خواوەندەوە موڵکێکی مەزنی ئەوتۆی پێ ببەخشرێت کە ماوەی نێوان هەموو دوو پلەیەکی پێنج سەد ساڵ ڕێ بێت؟

ئنجا ئێمە لەم دنیا چڕ و پڕ و تاریك و تەسکەدا، هەموو ئەمانەی کە باسیان دێت دەزانین و دەیانبینین:

★ بوونی خودی خۆر لە چەندین ئاوێنەی یەکجار زۆر و لە یەك کاتدا..

★ بوونی زاتێکی نوورانی لە یەك کاتدا، لە چەندین شوێنی زۆردا..

★ ئامادەبوونی حەزرەتی جیبریل - دروودی لەسەر بێت - لە هەزار و یەك ئەستێرەدا و، لە بەردەم عەرشی مەزن و، لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و، لە حوزووری خوای گەورەدا، لە یەك کاتدا.

---

(١) مەبەست باخەکەی ئەو "کاك سلێمان"ە کە بە وەفاداری‌یەکی تەواو ماوەی هەشت ساڵی ڕەبەق خزمەتی ئەم هەژارەی کرد. ئەم باسەش لەو باخەی ئەودا و لە ماوەیەکی نزیکەی دوو سەعاتدا نووسرا. (دانەر)

★ چاو كەوتنی پێغەمبەر ﷺ لە یەك كاتدا بە هەموو خواناسانی نەتەوەكەی، لە حەشری مەزندا..

★ دەركەوتنی پێغەمبەر ﷺ لە دنیادا لە چەندین مەقام و پلەی لەسنووربەدەرد. هەرهەمووشیان لە یەك كاتدا..

★ بینینی ئەبدالەكان - كە جۆرێكی سەیری ئەولیاكانن - لە چەندین شوێنی زۆر، لە یەك كاتدا..

★ بینین و ئەنجامدانی كاری ساڵێكی تەواو لە خەونی یەك دەقیقەیی هەموو كەسێكدا..

★ ئامادەبوونی مرۆڤ بە (دڵ و گیان و ئەندێشە) لە چەندین شوێنی زۆر و پەیوەندی كردن لەگەڵ ئەو هەموو شوێنانەدا، لە یەك كاتدا..

هەموو ئەمانە، لەم دنیا چڕ و تاریكەدا، لای خەڵكی ئاشكرا و زانراون.

كەواتە، بەهەشتی‌یان - كە سووكی و هێزی لەشیان وەك هی ڕۆح وایە و تیژیی ئەو لەشانەشیان بە وێنەی تیژڕەویی ئەندێشە وایە - بێ هیچ گومانێك، ئامادەبوونی ئەمانە لە سەد هەزار شوێن و، تێكەڵبوونی هەریەكەیان لەگەڵ سەد هەزار حۆریدا و، چەشتنی سەد هەزار جۆری تام و لەزەتەكانی ئەوێ لە یەك كاتدا، كارێكە شیاوی بەهەشتی هەمیشەیی و نوورانی و بێ‌سنوور و فراوان و بەرینە و، بە یەكجاری و تەواوی لەگەڵ میهرەبانیی ڕەهای خواوەنددا تەبا و گونجاوە و، یەكاویەك دەردەچێت لەگەڵ ئەو هەواڵەی كە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە. كەواتە شتێكی حەق و ڕاست و ڕەوایە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا كە باس كران، دەبێ بزانین: ئەو ڕاستی‌یە مەزن و یەكجار بەرزانە، بە پێوەری ژیری‌یە بچووكەكانی ئێمە ناپێورێن!

بەڵێ، پێویست ناكات عەقڵە بچووكەكان پەی بەو واتایانە ببەن، چونكە ئەم تەرازووە ناتوانێت قورسایی تا ئەو ئەندازەیە هەڵبگرێت!

﴿**سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنتَ الْعَليمُ الحَكيمُ**﴾.

﴿**رَبَّنا لا تُؤاخِذْنَا إنْ نَسيْنَا أوْ أخْطَأنا**﴾ (البقرة:٢٨٦).

اللهم صلِّ على حبيبك الذي فتح أبوابَ الجنةِ بحبيبته وبصلاته، وأيّدتَ أمته على فتحها بصلواتهم عليه، عليه الصلاة والسلام.

اللهم أدخلنا الجنة مع الأبرار بشفاعة نبيك المختار. آمين.

* * *

# پاشکۆیەکی بچووك

## تایبەته بە دۆزەخەوە

ئیمان تۆوی بەهەشتێکی مەعنەویی تێدایە، هەروەك کوفر تۆوی زەققوومی دۆزەخێکی مەعنەویی لە خۆدا حەشار داوە. وەك لە وتەی دووهەم و وتەی هەشتەمدا چەسپاندمان.

چونکە کوفر تۆوێکە بۆ سەوزبوونی دۆزەخ، دۆزەخیش بەروبوومی ئەو تۆوەیە. ئنجا هەروەك کوفر هۆیەکە بۆ چوونە ناو دۆزەخ، بە هەمان جۆر هۆیشە بۆ بەدیهێنان و پەیدا کردنی. چونکە ئەگەر فەرمانڕەوایەکی بچووك کە خاوەنی عیززەت و غیرەت و شکۆیەکی ئاسایی بێت و، پیاوێکی بەدڕەوشتیش سنگی لێ دەربپەڕێنێت و پێی بڵێت: تۆ هەرگیز ناتوانیت من تەمێ بکەیت. ئەوا بێ هیچ گومانێك ئەو فەرمانڕەوایە گەر پێشتر بەندیخانەشی نەبوو بێت، هەر بە تایبەتکاری بەندیخانەیەك بۆ ئەو بەدبەختە دروست دەکات و دەیهاوێتە ناوی!

خۆ بابای کافریش کە ئینکاریی بوونی دۆزەخ دەکات، پادشایەك بەدرۆ دەخاتەوە کە دارای عیززەت و غیرەت و شکۆمەندیی ڕەهایە و، کۆڵەواری دەداتە پاڵ کەسێك کە توانای ڕەهای هەیە و، بە "درۆزنی" و "بێ دەستەڵاتی" تۆمەتباری دەکات.

کەواتە هەر بە کافربوونەکەی کارێك دەکات کە بە توندی توخنی عیززەتی ئەو دەکەوێت و، بە هەموو هێزێکیەوە دەست لە غیرەتی ئەو دەدات و، بە: گوێڕایەڵی نەکردن و پشتگوێ خستنی فەرمانەکانیشی تانە ئاراستەی شکۆمەندیی ئەو دەکات.

بێ گومان ئەگەر هیچ هۆکارێکی تریش بۆ بوونی دۆزەخ لە کایەدا نەبێت - کە ئەمەش گریمانێکی مەحاڵە - ئەوا خوای گەورە دۆزەخ بۆ ئەو کافرە دروست دەکات و دەیهاوێتە ناوی، ئەو کافرەی کە کوفرەکەی تا ئەم ڕادەیە بەدرۆخستنەوەی خوای گەورەی تێدایە و، کۆڵەواری و بێدەستەڵاتی دەداتە پاڵی.

﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ (آل عمران:١٩١).

# وتەی بیست و نۆهەم

**تایبەتە بە: مانەوەی ڕۆح و، مەلائیکەت و، حەشرەوە**

بسم الله الرّحمن الرّحيم

**﴿تَنَزَّلُ الْمَلٰئِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ﴾** (القدر:٤)

**﴿قُلْ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾** (الإسراء:٨٥)

**(ئەم مەقامە بریتی‌یە لە پێشەکی‌یەك و دوو مەبەستی بنەڕەتی)**

## پێشەکی

دەتوانرێت بوترێت: بوونی مەلائیکەت و جیهانی ڕۆحانی وەك بوونی مرۆڤ و زیندەوەران بێ گومان و چەسپاوە.

چونکە هەروەك لە "پلەی یەکەمی وتەی پازدەهەم"دا ڕوونمان کردووەتەوە: "ڕاستی" و "حیکمەت" بە بێ گومانی، داخوازی ئەوەن کە ئاسمانەکان - وەك زەوی - سەرنشینیان ببێت، هەروەها دەبێ ئەو سەرنشینانەش خاوەنی هەست بن و لەگەڵ نیشتەجێی خۆیاندا زۆر لەبار و شیاو بن.. جا ئەو سەرنشینە جۆراوجۆرانەی ئاسمان، لە زاراوەی ئاییندا بە "مەلائیکەت"و "ڕۆحانی‌یەکان" دەناسرێن.

بەڵێ، ڕاستی(الحقيقة) داخوازی ئەوەیە، چونکە زەوی لەگەڵ ئەم قەبارە لاوازی و بچووکی‌یەی لەچاو ئاسمانەکاندا، بەردەوام لە گیاندارە خاوەن هەست و شعوورەکان پڕ دەکرێت و خاڵیش دەکرێتەوە. ئەمەش پەنجە بۆ ئەوە درێژ دەکات، بەڵکو بە ئاشکرا ئەوە دەردەبڕێت کە:

ئەم ئاسمانە خاوەن بورجانـەی کـە دەڵێـی چـەند کۆشـکێکی ڕازاوەن، پڕن لـە گیـاندار و خاوەن هەست و شعووری ئەوتۆ کە ڕوونـاکیی بـوون و ژیـان بـن و، ئـەو بوونەوەرانـەش "بـە وێنەی ئینس و جیننی" سەیرکەری کۆشکی مەزنی ئەم جیهانە و، خوێنـەری کتێبـی گـەورەی ئەم گەردوونەن و، ڕێنما و بانگەوازکارن بۆ گەیشتن بە پادشای ئـەم پەروەردگارێتی‌یـەی کـە ئەم بوونەوەرانە بەڕێوە دەبات و، بە بەندایەتی‌یە هەمەکی‌یەکەیان نوێنەری ویـرد و تەسبیحاتی بوونەوەرە مەزنەکانن.

بەڵێ، جۆراوجۆریی بوونەوەران، بەڵگەی بوونی مەلائیکەتانە. چونکـە بوونـەوەرێك کـە بەوپەڕی وردەکاریی لەژمارەبەدەر و جوانیی خاوەن واتا و نەخش و نیگـاری ڕازاوەی پڕ لـە حیکمەت ڕازابێتەوە، بێ گومان داخوازی ئەوە دەبێت کە چەندین خاوەن هەسـت و شـعوور بـبن لێـی ورد ببنـەوە و بەلایانـەوە جـوان بێـت و سەرسـامی و ڕێزلـێ گرتنی خۆیـان لـە بەرامبەریەوە دەرببڕن[1].

بەڵێ، هەروەك "جوانی" داخوازی "شەیدا"یەکە و، هـەروەك "خواردەمـەنی" بـە "برسـی" دەدرێت.. ئەم وردەکاری‌یانەش، کـە خۆراکـی ڕۆح و بژێـوی دڵانـن، دەبێ بەڵگـەی بوونـی مەلائیکەت و جیهانی ڕۆحانی بن و بۆ ئەوان تەرخان کرابن.

جا لەبەر ئەوەی ئەم ئارایشتە زۆر و بێ‌پەی و نەبڕاوەیـەی گـەردوون داخـوازی تێڕامـان و پەرستشێکی بێ پایانی بەدیهێنەریەتی، لە کاتێکدا کە "ئینس و جیننی" بەشێکی کەمی - یـەك لـە ملیۆنی - ئـەم تێڕامـان و پەرستشـە نـەبێت زیاتریـان لـە توانـادا نی‌یـە، ئـەوا دەبـێ ئـەم فەرمانبەری‌یـە نـەبڕاوە و پەرستشـە جۆراوجۆرانـە پێویسـتیان بـە چـەندین "مەلائیکـەت" و "ڕۆحانی" ببێت تاکو بەڕێوەیان ببەن و ڕیز ڕیز ڕابووەستن بۆ ئەوەی ئەم مزگەوتـە گەورەیـەی جیهان و گەردوون بە سوژدە و پەرستشیان ئاوەدان بکەنەوە.

بەڵێ، لە هەموو کـەنار و شـوێن و فەرمانگەیـەکی ئـەم بوونـەوەرەدا چـەندین کارمـەند لـە جۆری "مەلائیکەت" و "ڕۆحانی‌یان" هەن کە هەریەکەیان ئـەرکێکی تایبـەتی و پەرستشـێکی دیاری کراوی پێ سپێرراوە.

بەپێی هێمای هـەندێ لـە فـەرموودەکانی پێغەمبـەر ﷺ، هـەروەها لـە ڕوانگـەی حیکمـەتی ڕێکوپێکی ئەم جیهانەوە، دەتوانرێ بوترێت:

---

(١) واتە: ئەم بوونەوەرە - بەم شێوەیە - داخوازی بوونی مەلائیکەتە. (وەرگێڕ)

هه‌ندێك له‌و ته‌نه بێ گیانه گه‌ڕۆكانه‌ی ناو بوونه‌وه‌ر، هه‌ر له‌ ئه‌ستێره‌كانه‌وه تا ده‌گاته دڵۆپه‌كانی باران، چه‌ند سوارگه‌ و كه‌شتی‌یه‌كن بۆ هه‌ندێ له‌و مه‌لائیكه‌تانه‌ی كه‌ به ئیزن و فه‌رمانی خوای گه‌وره ده‌چنه ناویانه‌وه و له‌سه‌ر ئه‌و كه‌شتی‌یانه‌وه ده‌ڕواننه جیهانی بینراو(عالَم الشهادة) و گه‌شتی تێدا ده‌كه‌ن، به‌مه‌ش ده‌بنه نوێنه‌ری ته‌سبیحاتی ئه‌و كه‌شتی‌یانه. جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی وه‌ك له‌ فه‌رمووده‌دا هاتووه [1]: (ڕۆحی شه‌هیدان له‌ جیهانی به‌رزه‌خ و به‌هه‌شتدا، ده‌چنه ناو سكی چه‌ند باڵنده‌یه‌كی سه‌وزه‌وه)، ئه‌وا ده‌توانین بڵێین: هه‌ر له‌و باڵنده سه‌وزانه‌وه – كه فه‌رمووده‌كه په‌نجه‌ی بۆ ڕاكێشاون – تا ده‌گاته ته‌نه زیندووه‌كانی تری وه‌ك "هه‌نگ" هه‌ریه‌كه‌یان چه‌ند كه‌شتی و فڕۆكه‌یه‌كن بۆ چه‌ندین جۆری ڕۆح، كه‌ به ئیزنی خوا ده‌چنه ناو جه‌سته‌ی ئه‌و زینده‌وه‌رانه و له‌ ڕێگای هه‌سته‌كانیانه‌وه ده‌ڕواننه جیهانی ماددی و، سه‌یری ورده‌كاری و جوانیی موعجیزاتی توانستی خوا ده‌كه‌ن و به‌مه ته‌سبیحاتی تایبه‌تیی خۆیان به‌جێ ده‌هێنن.

هه‌روه‌ك "ڕاستی" داخوازی بوونی مه‌لائیكه‌ت بوو، هه‌روه‌ها "حیكمه‌ت"یش داخوازی بوونیانه. چونكه ئه‌و كردگاره دانایه‌ی كه ژیانێكی ناسكی خاوه‌ن هه‌ست و هۆش له‌م گڵه چڕه‌دا دروست بكات، له‌ كاتێكدا كه‌ گڵ تابڵێی له‌گه‌ڵ "ڕۆح"دا كه‌م په‌یوه‌ندی‌یه.. هه‌روه‌ها له‌ ئاوی لیڵ ژیان پێك بهێنێت، له‌ كاتێكدا كه په‌یوه‌ندی‌یه‌كی كه‌می له‌گه‌ڵ ژیاندا هه‌یه.. ده‌بێ هه‌ر هه‌مان كردگار چه‌ندین دروستكراوی تری خاوه‌ن هه‌ست و شعووری بێت، كه‌ له‌ ده‌ریای ڕووناكی و، تاریكی و، هه‌وا و، كاره‌با و، هه‌ر شتێكی تری ناسك(لطيف) دروستیان بكات، كه هه‌ریه‌ك له‌وانه له‌گه‌ڵ ژیان و ڕۆحدا گه‌لێ نزیكتر و شیاوترن.

* * *

(١) بڕوانه: صحيح الإمام مسلم، كتاب الامارة، باب في بيان أنّ أرواحَ الشهداءِ في الجنة. (٦/٣٨). (وه‌رگێڕ)

# مەبەستی یەکەم

## "باوەڕ بە مەلائیکەت" یەکێکە لە پایەکانی ئیمان

**(ئەم مەبەستە چوار سەرنج و بنچینەی سەرەکیی تێدایە)**

# بنچینەی یەکەم

کەماڵی "بوون" بە ژیانەوەیـە، تەنانـەت بوونـی ڕاستەقینەی "بـوون" بـەندە بـە "ژیـان"ەوە. چونکە ژیان ڕووناکیی بوونەوەرە و، هەست و شعووریش ڕووناککەرەوەی ژیانە. هـەروەها ژیان بناغە و بنچینەی هەموو شتێکە و، هەر ئەوە کە هەموو شتێك دەکات بـە مولکـی هـەموو گیاندارێك، واتە شتی خاوەن ژیـان(زینـدەوەر) وەك خـاوەنی هـەموو شـتێك لـێ دەکـات و، هـەر تەنهـا بەهـۆی ژیانەوەیە کـە ئـەو زیندەوەرە دەتـوانێ بلێـت: (ئـەم شـتانە هی منـن و، دنیـا ماڵ و جێگامە و، بوونەوەریش مولکێکە خاوەنەکەم پێی بەخشیوم).

هەروەك "ڕووناکی" هـۆی بینینـی هـەر جەستەیەکە و هۆکـاری دەرکـەوتنی ڕەنگەکانـە، بەپێی وتەی هەندێ لە زانایان، بـە هـەمان جـۆر "ژیـان"یـش هۆکـار و دەرخـەر و پیـشاندەری بوونەوەرانە و، هۆی هاتنەدیی جۆراوجۆرییەکان(نوعیات)ە.. هەر ژیانە کە بەشێکی کەمی هەندەکی(جزئی) دەکاتە گشتی و هەمەکی(کلی) و، شتی گـەورە و هەمـەکیش لـە بەشـێکی بچووکدا جێ دەکاتەوە.. هەر ژیانە هۆی کەماڵی بـوون و بوونـەوەرە، چونکـە ژیـان هـەموو شتێکی تر دەکاتە هاوبەشی یەکتری و یەکێتی دەخاتە نێوان شتانی زۆر و زەبەندە و دەیانکات بە خولگەی "تاکی"ی "تەنیا"یەك، تەنانەت "ژیان" جۆرێکـە لـە درەوشـانەوەی ئـەو "تـەنیا"یـە لەناو چینە زۆرەکانی بوونەوەردا و، ئاوێنەیەکە ئەو تاك و تەنیاییەی تێدا دەردەکەوێت.

با ئەم قسەیە ڕوون بکەینەوە:

سه‌یری ته‌نێكی بێ گیان(جامد) بكه‌، با چیایه‌كی گه‌وره‌ش بێت، له‌ ڕاستیدا: نامۆیه‌.. هه‌تیوه‌.. ته‌نیایه‌! چونكه‌ په‌یوه‌ندیی ئه‌و ته‌نها له‌گه‌ڵ جێگاكه‌ی خۆیدایه‌ و زیاتر تێپه‌ڕ ناكات و، هه‌ر شتێكی تر كه‌ له‌ بوونه‌وه‌رانی تردا هه‌ن سه‌باره‌ت به‌و وه‌ك "نه‌بوو" وان، چونكه‌ نه‌ "ژیان"ی هه‌یه‌ تا بتوانێت په‌یوه‌ندییان له‌گه‌ڵدا په‌یدا بكات، نه‌ خاوه‌نی هه‌ست و شعووریشه‌ تا به‌هۆیه‌وه‌ په‌یوه‌ستیان بێت و ئه‌و په‌یوه‌ندییه‌یان له‌گه‌ڵدا ببه‌ستێت.

به‌ڵام ته‌ماشای ته‌نێكی بچووكی زیندووی خاوه‌ن ژیانی - بۆ نموونه‌ - وه‌ك "هه‌نگ" بكه‌. ده‌بینیت هه‌ر كه‌ ژیانی تێ‌ده‌چێت، یه‌كسه‌ر په‌یوه‌ندی و عه‌قدێكی بازرگانی له‌گه‌ڵ هه‌موو بوونه‌وه‌ران، به‌ تایبه‌تی له‌گه‌ڵ ڕووه‌ك و گوڵه‌كانی زه‌ویدا ده‌به‌ستێت، به‌ ڕاده‌یه‌ك كه‌ ده‌توانێت بڵێت: (هه‌موو سه‌رزه‌وی باخچه‌ و جێگای بازرگانیمه‌).

كه‌واته‌ جگه‌ له‌ هه‌سته‌ دیار و نادیاره‌كانی زینده‌وه‌ران، چه‌ند پاڵپێوه‌نه‌رێكی سروشتیی نادیاری هانده‌ر و ڕێگاخۆشكه‌ر هه‌ن كه‌ پاڵ به‌ هه‌نگه‌وه‌ ده‌نێن و ڕێگای بۆ ئاسان ده‌كه‌ن تا بتوانێت تێكه‌ڵاوی و هه‌ڵسوكه‌وت و ئاڵوگۆڕ له‌گه‌ڵ زۆربه‌ی بوونه‌وه‌رانی دنیادا بكات و خۆی له‌گه‌ڵیاندا بگونجێنێت.

"ژیان" كه‌ بتوانێت - به‌و جۆره‌ - كاریگه‌ریی خۆی له‌ زینده‌وه‌رێكی بچووكی وه‌ك هه‌نگدا ده‌ربخات، ئه‌وا دیاره‌ تا ژیانی ئه‌و زینده‌وه‌ره‌ گه‌وره‌تر و پله‌ی به‌رزتر بێت تا ده‌گاته‌ پله‌ی "ئاده‌می" كه‌ به‌رزترین پله‌یه‌، ئه‌و كاریگه‌رییه‌ی پتر فراوان و گه‌وره‌ و ڕووناكیبه‌خش ده‌بێت. به‌ جۆرێك كه‌ مرۆڤ به‌ عه‌قڵ و هه‌ست و شعووری خۆی - كه‌ ئه‌م هه‌ست و شعووره‌ش ڕووناكیی ژیانه‌ - ده‌توانێت به‌ ناو هه‌موو جیهانه‌ به‌رز و ڕۆحی و ماددییه‌كاندا بگه‌ڕێت، وه‌ك به‌ ناو ژووره‌كانی خانووی خۆیدا هاتوچۆ بكات. ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌ ده‌گه‌یه‌نێت كه‌ هه‌روه‌ك ئه‌و خاوه‌ن هه‌ست و شعووره‌ به‌ چه‌شنێكی مه‌عنه‌وی (به‌ عه‌قڵ و شعوور) ده‌ڕواته‌ ناو ئه‌و جیهانانه‌وه‌، ئه‌و جیهانانه‌ش ده‌بن به‌ میوان و له‌سه‌ر ئاوێنه‌ی ڕۆحی ئه‌ودا ده‌رده‌كه‌ون.

ژیان (خۆی له‌ خۆیدا) ڕووناكترین به‌ڵگه‌ی تاك و ته‌نیایی خوای باڵاده‌سته‌ و، فراوانترین جێگای تیاده‌ركه‌وتنی نیعمه‌ته‌ گه‌وره‌كانیه‌تی و، ناسكترین جیلوه‌ی میهره‌بانی و، وردترینی نه‌خش و نیگاره‌ شاراوه‌ و خاوێنه‌كانی ئه‌و خواوه‌نده‌ به‌ده‌سته‌ڵاته‌یه‌.

به‌ڵێ، ژیان شاراوه‌ترین و وردترینی ئه‌و نه‌خش و نیگارانه‌یه‌ كه‌ له‌ دروستكراوه‌كانی خوادا ده‌رده‌كه‌ون. چونكه‌ بێداربوونه‌وه‌ و ده‌مكردنه‌وه‌ی خونچه‌ی ژیان له‌ "تۆو"دا - كه‌ یه‌كه‌م پله‌ی ژیانه‌ له‌ ڕووه‌كدا، كه‌ ڕووه‌كیش نزمترین پله‌كانی ژیانی تێدایه‌ - هه‌ر له‌

سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - سلاوی خوای لێ بێت - تا ئێستا، لەگەڵ ئەو ئاشکرایی و زۆری و ڕاهاتنەش لەگەڵی‌دا، کەچی لە زانیاریی مرۆڤدا هەر نهێنی بووە و ڕاستی‌یەکەی بە ئاشکرا و تەواوی بۆ زۆربەی مرۆڤ ڕوون نەبووەتەوە!

هەروەها ژیان خاوێنترینیشیانە، بە چەشنێك کە هەردوو ڕووەکەی: بینراو و نەبینراو(المُلْك والمَلكـــــوت) زۆر ڕوون و بێ گەردن. چونکە دەستی توانستی خوا بە بێ بەکارهێنانی هیچ هۆکارێك کاری خۆی لە ژیاندا دەکات، بەڵام لە شتی تردا هەمان دەستی توانست هۆکارە ئاشکراکان دەکات بە پەردە و لە پشتیانەوە کاری خۆی ڕایی دەکات، بۆ ئەوەی ئەو هۆکارانە ببن بە سەرچاوەی ئەو کاروبار و چۆنێتی‌یانەی کە بە چەشنێکی بێ گەرد پێش‌چاو ناکەون و، بە ڕواڵەت لەگەڵ گەورەیی و شکۆمەندیی ئەو توانستەدا ناگونجێن.

**بە پوختی**: دەتوانرێت بوترێ: گەر ژیان لەکایەدا نەبێت، "بوون"یش بوونی نابێت، بەڵکو هیچ جیاوازی‌یەکی لەگەڵ "نەبوون"دا نابێت. چونکە ژیان ڕۆشنایی "ڕۆح"ە و هەست و شعووریش ڕووناکیی "ژیان"ە.

جا مادەم ژیان و هەست و شعوور ئەوەندە گرنگی‌یان هەیە و، مادەم ئێمە ئەم ڕێکوپێکی و وردەکاری و توندوتۆڵی و پێکەوەگونجانەی هەموو بەشەکانی گەردوون دەبینین و، مادەم ئەم سەرزەوی‌یەی خۆمان - کە وەك گەردیلەیەك وایە لەچاو گەردووندا - پڕە لە گیانداری خاوەن ژیان و هەست و شعوور، بێ گومان دەبێ، بە حوکمی یەقین و ژیری، هەموو گۆشە و کەنار و جێگایەکی تری ئەم کۆشك و بورجە گەورانەی ئاسمان پڕ بن لە چەندین گیانداری خاوەن هەست و شعوور، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە لەگەڵ ئەو دەوروبەرەی خۆیاندا بگونجێن و لەگەڵیاندا شیاو بن. چونکە هەروەك "ماسی" لەناو ئاودا دەژی، بە هەمان جۆر دەگونجێ لەناو بلێسەی گەرمای "خۆر"یشدا چەندین جۆر سەرنشینی "نوورانی" ببن کە لەگەڵ ئەو دەوروبەرەی خۆیاندا بگونجێن. (چونکە ئاگر ڕووناکی ناسووتێنێت بەڵکو پەرەی پێ دەسێنێت).

هەروەها مادام توانستی خوای گەورە لە جۆرەها ماددەی ئاسایی، تەنانەت لە چڕترین جۆری ماکەکانی بوونەوەر، زیندەوەری لەژمارەبەدەر دروست دەکات و، مادەم هەمان توانست چڕترین ماددە دەگۆڕێت و ژیانی بە بەردا دەکات و بەوپەڕی وردەکاری ماددەیەکی نەرم و ناسکی لێ پێکدەهێنێت و، ڕووناکیی ژیان لە هەموو شتێکدا بڵاو دەکاتەوە و، بە

ڕۆشنایی هه‌ست و شعوور زۆربه‌ی شتی بوونه‌وه‌ران ده‌ڕازێنێته‌وه.. ئه‌وا ده‌بێ هه‌ر خاوه‌نی ئه‌م توانسته دانایه: ڕووناكی و هه‌وا و "ئه‌ثیر" و شتانی تری هاوچه‌شنیان، كه له‌گه‌ڵ ڕۆح و ژیاندا زیاتر ده‌گونجێن، له "ژیان" بێبه‌ش نه‌كات و ده‌ستیان لێ هه‌ڵنه‌گرێت و به بێ هه‌ست و شعوور نه‌یانهێڵێته‌وه. به‌ڵكو ڕه‌واتر وایه كه ئه‌م توانسته ڕه‌هایه چه‌ندین گیاندار و شتی خاوه‌ن هه‌ست و شعوور له‌و مادده دیاریكراوانه دروست بكات، به‌ڵكو له مادده‌ی نوور و له تاریكی و له مادده‌ی "ئه‌ثیر" و ته‌نانه‌ت له هه‌وا و له جیهانی "مه‌عنا"یش چه‌ندین جۆر شتی ئه‌وتۆ دروست بكات كه ڕۆحیان له یه‌كتر جیاواز بێت به چه‌شنی جیاوازیی جۆره‌كانی گیانداران، به‌م پێیه هه‌ندێكیان بكات به "مه‌لائیكه‌ت" و هه‌ندێكی تریش بكات به "جینی" و "جیهانی ڕۆحانی".

سه‌ره‌ڕای ئه‌مه‌ش، ده‌توانیت له ڕوانگه‌ی ئه‌م نموونه‌یه‌ی خواره‌وه بێ گومانی و ئاشكرایی بوونی مه‌لائیكه‌ت و ڕۆحانی‌یانت بۆ ده‌ربكه‌وێت، وه‌ك قورئانی پیرۆز ڕوونی كردووه‌ته‌وه. هه‌روه‌ها پووچه‌ڵی و گومڕایی ئه‌و بۆچوونه‌شت بۆ ده‌ربكه‌وێت كه دان به‌مه‌دا نانێت و، بزانیت چه‌نده له دانایی و ڕاستی‌یه‌وه دووره:

له گه‌شتێكدا دوو كه‌س، كه یه‌كێكیان: نه‌زان و ده‌شته‌كی، ئه‌وی‌تریشیان: شاره‌زا و خه‌ڵكی شار بوو، پێكه‌وه به‌ره‌و شارێكی گه‌وره‌ی وه‌ك ئه‌سته‌مبووڵ كه‌وتنه‌ڕێ. به‌ڵام پێش ئه‌وه‌ی بگه‌نه ناو شار و، له سووچێكیه‌وه، ڕێیان كه‌وته خانوویه‌كی بچووك و وه‌رشه‌یه‌كی پیس و چه‌په‌ڵ. سه‌یریان كرد ئه‌م خانووه پڕه له كرێكاری ماندوو كه هه‌ریه‌كه‌یان سه‌رگه‌رمی كاروباری خۆیه‌تی له‌م كارگه سه‌یر و نامۆیه‌دا. له ده‌ره‌وه و ده‌ورووپشتی ئه‌م خانووه‌شدا چه‌ندین ئاژه‌ڵ و زینده‌وه‌ری جیاجیایان بینی كه هه‌ریه‌كه‌یان به گوێره‌ی پێویستی و مه‌رجه‌كانی ژیانی خۆی، خه‌ریكی له‌وه‌ڕ و خواردن بوون، هه‌ندێكیان ڕووه‌كی ده‌خوارد و، هه‌ندێكی تر ماسی و... هتد. پاش بینینی ئه‌مه، سه‌ریان به‌رز كرده‌وه، هه‌زاران ته‌لاری ڕازاوه و كۆشكی به‌رزیان له دووره‌وه بینی، كه له نێوان هه‌ریه‌كه و ئه‌وانی تردا چه‌ندین گۆڕه‌پانی گه‌وره و فراوان هه‌بوون، به‌ڵام دانیشتووانی ئه‌م كۆشكانه به چاو نه‌ده‌بینران، چ له‌به‌ر دووری‌یان، چ له‌به‌ر كزیی چاوی ئه‌مان، یان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌و دانیشتووانه خۆیان ده‌رنه‌ده‌خست و مه‌رجه‌كانی ژیانیش، كه له‌م كارگه پڕ له چه‌په‌ڵی‌یه‌دا هه‌یه، له‌وێدا نه‌بوو..

لێره‌دا ده‌شته‌كی‌یه‌كه‌یان - كه تا ئێستا شاری نه‌دیبوو - وتی:

(ئەو کۆشکانە هیچ گیانلەبەرێکیان تێدا نی‌یە و چۆڵن، چونکە من نایانبینم و هیچ شتێکیش لەو کۆشکانەدا نی‌یە - وەك ئێرە - پەنجە بۆ بوونی ژیان ڕابکێشێت تیایدا).

ئیتر بەم جۆرە وڕێنەیە بێ‌عەقڵی و نەزانیی خۆی ئاشکرا کرد!

هاوەڵە شارەزا و عاقڵەکەی، بە لەسەرخۆیی‌یەوە، پێی وت:

(کاکی خۆم! ئایا ئەم خانووە بچووك و کەم نرخە نابینیت کە پڕە لە زیندەوەران؟ ئایا نابینیت ئەوانە یەك بست چۆڵایی‌یان نەهێشتووەتەوە و، یەکێك هەیە هەردەم دەیانگۆڕێت و هی‌تر دەهێنێت و دەیانخاتە سەر کار؟ ئایا دەگونجێ ئەو تەلارە ڕێکوپێك و کۆشکە ڕازاوە دوورانە کەسیان تێدا نەبێت کە لەگەڵ ئەو دەوروبەرەدا بگونجێ؟.. نەخێر! ئەمە شتێکی مەحاڵە، بەڵکو دەبێ ئەو کۆشکانە پڕ بن لە گیانداری ئەوتۆ کە مەرجەکانی ژیانی خۆیانی تێدا بێت، بەڵام نەبینینیان لەبەر دووری، یان کزیی چاو، یان لەبەر دەرنەکەوتنیان، هەرگیزاو هەرگیز نابێت بە بەڵگە لەسەر نەبوونیان. چونکە هیچ کاتێك نەبینین و دەرنەکەوتن نەبووە و نابێتە بەڵگە لەسەر "نەبوون"ی هیچ شتێك)!

لەبەر ڕووناکیی ئەم نموونە ئاشکرا و ئاسایی‌یەدا دەتوانین بڵێین:

ئەم سەرزەوی‌یەی ئێمە کە یەکێکە لە قەبارەکانی ئەم ئاسمانە گەورەیە، هەرچەندە لەچاو قەبارەکانی تردا بچووکە، کەچی دەبینین بووە بە مەڵبەندێك بۆ جۆرەها جۆری لەژمارەبەدەری گیاندار و خاوەن هەست و شعوورەکان، تەنانەت چەپەڵترین جێگای زەوی بووە بە سەرچاوە و پیشانگا و کانگایەکی گەورەی بەشێکی زۆر لە گیاندارە ورد و بچووکەکان..

جا زەوی‌یەك کە بەم بچووکی‌یەی خۆی ئاوا بوو بێت بە مەڵبەندی ئەو هەموو گیاندار و بوونەوەرە خاوەن هەست و شعوورانە، دەبێ بە حوکمی ژیری و زەرووڕەت و یەقینی بێ گومان، ئەو فەزا و بۆشایی‌یە فراوانەی ئاسمان و، ئەو ئاسمانە خاوەن بورج و ئەستێرە و هەسارە گەورانەش، پڕ بن لە گیاندار و بوونەوەری خاوەن هەست و شعوور. قورئانی پیرۆز و شەریعەتی پاکی ئیسلام ئەو خاوەن گیان و هەست و شعوورانە، کە لە ڕووناکی و ئاگر و تاریکی و هەوا و دەنگ و بۆن و وتە و ئەثیر و تەنانەت لە کارەبا و شتانی ناسك و ڕەوانی تر دروست کراون، ناو دەنێن بە: "مەلائیکەت" و "جان" و "ڕۆحانی‌یەکان"..

بەڵام ئەوەندە هەیە، وەك هەر تەنێك لە یەکێکی تر جیاوازە، هەروەها مەلائیکەتیش وان، چونکە جۆری ئەو مەلائیکەتەی کە کاروباری دڵۆپی بارانی پێ سپێرراوە، جیاوازە لەوەی کە کاروباری خۆری پێ سپێرراوە.. هەروەها "جیننی" و "ڕۆحانی"یەکانی تریش، ڕەگەز و جۆریان لە یەکتر جیاوازە.

**کۆتایی ئەم بنچینە سەرەکی‌یە:**

بە تاقیکردنەوە چەسپاوە کە: "مادده" ئەسڵ و بنچینە نی‌یە تاکو هەموو شتێك ببێت بە شوێنکەوتەی مادده و لە ژێر فەرمانی ئەودا بێت. بەڵکو مادده بە "مەعنا"یەکەوە بەستراوە و ڕاوەستاوە کە بریتی‌یە لە: ژیان.. لە: ڕۆح..

هەروەها بە بینین و سەرنجدان بۆمان دەردەکەوێت کە مادده شتێکی ئەوتۆ نی‌یە نەتوانرێت بێ‌گوێیی بکرێت و هەموو شتێك لە کاروبار و فرمانەکانی‌دا پێویست بێت بۆ لای ئەو بگەڕێتەوە، بەڵکو مادده: هۆکار و خزمەتکارێکی گوێڕایەڵە بۆ تەواوکردنی ڕاستی‌یەکی تایبەتی، کە بریتی‌یە لە: ژیان.. کە بناغەی ئەو ڕاستی‌یەش: "ڕۆح"ە..

هەروەها ئاشکرایە کە مادده فەرمانڕەوایەك نی‌یە خاوەنی بەخشندەیی بێت و کەماڵات و ڕەوشتی بەرزی لێ داوا و چاوەڕوان بکرێت، بەڵکو مادده شتێکی فەرمان بەسەردا دراوە و بە ئاماژەی شتێکی بنەڕەتی و تایبەتی‌یەوە دەڕوات و دەجوولێتەوە، ئەو شتە بنەڕەتی‌یەش بریتی‌یە لە: ژیان.. لە: ڕۆح.. لە: هەست و شعوور..

هەروەها "زەروورەت" داخوازی ئەوەیە کە هیچ کردار و ڕەوشتێك بە ماددەوە نەبەسترێت و لە ڕۆشنایی ئەودا بنیات نەنرێت، چونکە مادده کاکڵ و ئەسڵ و بنچینە و بناغەیەکی نەجووڵاو نی‌یە، بەڵکو توێکڵ و بەرگ و کەف و وێنەیەکە لەت لەت بوون و تواندنەوەی لە ڕێگادایە و پرتووکان و ڕزینی بەسەردا دێت.

ئایا نابینیت ئەو گیانلەبەرە وردیلانەی کە بە چاو نابینرێن، چەند هەستێکی ئەوەندە ناسك و تیژیان هەیە کە چپەی هاوجۆرەکانی خۆیانی پێ دەبیستن و سەرچاوەی ڕۆزیی یەکتری پێ دەبینن؟!

ئەمە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە مادده تاکو وردتر و بچووکتر بێت، زیاتر شوێنەوار و شەقڵی ژیانی پێوە دیار دەبێت و زیاتر و توندتر ڕووناکیی ڕۆحی لێ دەدرەوشێتەوە. چونکە مادده تا وردتر بێت و لە ماددیەتی ئێمە دوورتر بکەوێتەوە، پتر لە جیهانی ڕۆح و ژیان و هەست و شعوورەوە نزیك دەبێتەوە و، ڕووناکیی ژیان و گەرمیی ڕۆحی زیاتر لێ دەردەکەوێت.

جا ئایا دەگونجێ ئەم هەموو نمانەی کە لە ژیان و هەست و ڕۆحەوە پاڵێوراون و بەچاو دەیانبینین و هەستیان پێ دەکەین و نم نم لە ماددەوە داچۆڕاون، هەر تەنها بە جیهانی ماددەوە

بەند بن و ئیتر جیهانی شارراوەی پشت پەردەی مادده پڕ نەبێت لە خاوەن ڕۆح و هەست و شعوورەکان؟!

ئایا دەگونجێ هەرچی "واتا" و "ڕۆح" و "حەقیقەت" و سەرچاوەکانیان هەیە، تەنها بۆ مادده و جموجوولەکانی لە جیهانی بینراودا بگەڕێنەوە و، هەر بەو جیهانە ڕووناك ببنەوە و دەربکەون؟!

نەخێر هەرگیز وا نییە. بەڵکو هەموو ئەمانە بۆمان دەردەخەن کە جیهانی بینراوی "مادده" بریتییە لە پەردەیەکی ڕازاوەی ئەوتۆ کە بەسەر ڕوخساری شارراوەی "مەلەکووت" و جیهانی "ڕۆح"دا دادراوەتەوە!

# بنچینەی دووهەم

دەتوانین بڵێین: جۆرە یەکدەنگییەك لە نێوان هەموو ڕێڕەوانی فەلسەفە و ئاییندا هەیە لەسەر بوونی ڕاستیی مەلائیکەت و جیهانی ڕۆحانی، هەرچەندەش هەریەکەیان بە شێوەیەکی جیاواز ئەمەیان دەربڕیوە، ئەمەش بە خۆیان زانیبێت یان نا.. بە ڕادەیەك ئەو فەیلەسووفانەش کە ڕێڕەوی گەڕۆکایەتی(المشائية)یان لە فەلسەفەی ورشەیی(إشــراقي)دا گرتبووەبەر، کە تابڵێی لە مەسەلەی ماددەدا ڕۆچووبوون، تەنانەت ئەوانیش ئینکاریی "واتا"ی مەلائیکەتیان نەکردووە، ئەوەتا لەم بارەیەوە وتوویانە: "هەموو جۆر(نوع)ێك چییەتی(ماهیــة)یەکی سەربەخۆی ڕۆحیی هەیە"! هەندێکی تریش لە فەیلەسووفە ئیشراقییەکان، کاتێ کە ناچار بوون دان بە شتێك لە واتای "مەلائیکەت"دا بنێن، وتوویانە: "ئەمانە پێیان دەوترێت: دە ژیرییەکان(العقول العشرة) و خاوەنی جۆرەکان"..

سەبارەت بە ئایینیشەوە، ئاشکرایە کە ڕێڕەوانی هەموو ئایینەکان باوەڕیان بەوە هەیە کە هەموو "جۆر"ێك لە جۆرەکانی بوونەوەر مەلائیکەتی سەرپەرشتیکاری خۆی هەیە کە لە ژێر فەرمان و ڕابەریی "وەحی"ی خوای گەورەدا کاروباریان بەڕێوە دەبەن. دەبینین بە هەندێکیان دەڵێن: "مَلَك الجبال" و هەندێکی تر: "مَلَك البحـار" هەندێکی تریش: "مَلَــك الأمطار"... هتد.

تەنانەت ماددی و سروشتییەکانیش، ئەوانەی کە ژیرییان دابەزیوەتە چاویان و لە ناوەرۆکی مرۆڤایەتی داماڵراون و گەیشتوونەتە پلەی: "جمـادات"، نەیانتوانیوە "واتـا"ی مەلائیکەت نەسەلمێنن! ئەوەتا ناوی: هێزە سارییەکان(القوى السارية) لەو یاسایانە دەنێن

كه‌ له‌ سروشتدا كار ده‌كه‌ن. خۆ هه‌رچه‌نده‌ش ئه‌مه‌ مه‌به‌سته‌كه‌ به‌ جوانی ڕوون ناكاته‌وه‌، به‌ڵام هه‌رچۆن بێت دانانێكی ناچاری‌یه‌ له‌ لایه‌ن ئه‌وانه‌وه‌ به‌ بوونی شتێك له‌ واتای مه‌لائیكه‌تدا!

جا ئه‌ی ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ له‌ باوه‌ڕهێناندا به‌ بوونی "مه‌لائیكه‌ت" و "جیهانی ڕۆحانی" له‌ دوودڵی دایت!

له‌م هه‌ڵوێسته‌تدا پشت به‌ چی ده‌به‌ستیت و، به‌ چ ڕاستی‌یه‌كه‌وه‌ ده‌نازیت تاكو بتوانیت له‌ به‌رامبه‌ر ئه‌م یه‌كده‌نگی‌یه‌ی هه‌موو ژیران و فه‌یله‌سووفانی جیهانه‌وه‌ ڕابووه‌ستیت؟ له‌ كاتێكدا كه‌ ئه‌وان - به‌ خۆیان زانیبێت یان نا - ئه‌و ڕاستی‌یه‌یان ده‌ربڕیوه‌ و بوونی مه‌لائیكه‌ت و جیهانی ڕۆحانی‌یان سه‌لماندووه‌؟

ماده‌م "ژیان" ده‌رخه‌ر و ئاكام و پوخته‌ و كاكڵی تێكڕای بوونه‌وه‌ران بێت - وه‌ك له‌ بنچینه‌ی یه‌كه‌مدا ڕوونمان كردووه‌ - ئنجا هه‌موو ژیرانی جیهانیش قسه‌یان له‌سه‌ر ئه‌وه‌ یه‌كانگیر بوو بێت كه‌ شتێك له‌و واتایه‌دا هه‌یه‌ كه‌ ئایین به‌ "مه‌لائیكه‌ت" ناوی ده‌بات.. مادەم ئه‌م سه‌رزه‌وی‌یه‌ی ئێمه‌ش پڕه‌ له‌م گیاندار و خاوه‌ن ژیانه‌ جۆراوجۆرانه‌ی كه‌ ده‌یانبینین، كه‌واته‌ چۆن ده‌بێ ئه‌م فه‌زا فراوان و ئاسمانه‌ ڕێكوپێكانه‌ چۆڵ بن و كه‌س نه‌بێت ئاوه‌دانیان بكاته‌وه‌؟!

هه‌رگیز ئه‌وه‌شت به‌ خه‌یاڵدا نه‌یه‌ت كه‌ ئه‌و یاسایانه‌ی له‌ جیهاندا هه‌ن، به‌س بن بۆ ئه‌وه‌ی ژیان به‌ بوونه‌وه‌ران ببه‌خشن، چونكه‌ ئه‌و یاسایانه‌ چه‌ند شتێكی گوێڕه‌یی و بڕیاردراون و چه‌ند یاسایه‌كی وه‌همین، بایه‌خیان نی‌یه‌، به‌ڵكو هه‌ر به‌ شتیش ناژمێررێن.

خۆ ئه‌گه‌ر چه‌ند به‌نده‌یه‌كی خواوه‌ند نه‌بن ئه‌م یاسایانه‌ به‌ڕێوه‌ ببه‌ن و ده‌ریانبڕن، هه‌رگیز ئه‌و یاسایانه‌ نه‌ده‌بوون و نه‌ده‌ناسران، چونكه‌ هیچیان بوونی ده‌ره‌كی(وجوودی خاریجی)یان نی‌یه‌. به‌ڵام "ژیان" له‌ ڕاستی‌دا بوونی ده‌ره‌كیی هه‌یه‌. خۆ ئاشكرایشه‌ "شتی وه‌همی" ناتوانێت شتێك بگرێته‌خۆ و هه‌ڵی بگرێت كه‌ بوونی ده‌ره‌كیی ڕاسته‌قینه‌ی ببێت.

**له‌مه‌وه‌ ده‌گه‌ینه‌ ئه‌و ئه‌نجامه‌ی كه‌:**

مادەم هه‌موو ڕێڕه‌وانی دانایی و ژیری و ئایین له‌وه‌دا یه‌كیان گرتووه‌ كه‌ "بوون" ته‌نها بریتی نی‌یه‌ له‌ جیهانی بینراو.. مادەم جیهانی بینراویش سه‌باره‌ت به‌ هه‌ڵگرتنی ڕۆح، به‌ ڕواڵه‌ت ڕه‌ق و نه‌شیاو دیاره‌، كه‌چی ده‌بینین پڕه‌ له‌ چه‌ندین جۆری له‌ژماره‌به‌ده‌ری خاوه‌ن ڕۆح و ژیان.. له‌به‌ر ئه‌مانه‌، هه‌رگیز ناگونجێ كه‌ "بوون" ته‌نها له‌م جیهانه‌دا بێت. به‌ڵكو چه‌ندین جۆری تری "بوون" هه‌ن كه‌ جیهانی بینراو له‌ چاویاندا وه‌ك په‌رده‌یه‌كی ڕازاوه‌ وایه‌ به‌سه‌ر ڕوخساریاندا دادرابێته‌وه‌.

هەروەها مادەم جیهانی شارراوەی "غـەیب" و "مـەعنا"، بە وێنـەی شـیاویی دەریاکـان بـۆ ماسی، لەگـەڵ "ڕۆح"دا تـەبا و شـیاون، ئـەوا دەبێ ئـەم جیهانانـە پڕ بن لـە چـەندین جـۆری ئەوتۆی ڕۆح کە لەگەڵ دەوروبەرەکانیاندا بگونجێن.

ئێستاش مـادەم هـەموو شتێك شـایەتیی خـۆی لەسـەر بوونـی "مەلائیکـەت" و "جیـهانی ڕۆحانی" دا، ئەوا هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە باشترین شێوە و چۆنێتی لە باسکردنیاندا، بە چەشنێك کە هەموو خاوەن هۆشێکی ژیر بتوانێت وەریبگرێت، ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز لـە بارەیانـەوە دواوە و ڕوونـی کردووەتـەوە. ئـەوەتا قورئـانی پـیرۆز مەلائیکـەت بـە: ﴿**عِبَـــادٌ مُكْرَمُون**﴾ (الأنبياء:٢٦) و ﴿**لا يَعْصُونَ اللهَ ما أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَـــرُونَ**﴾ (التحـريم:٦) نـاو دەبات.

مەلائیکەت چەند جەستەیەکی نوورانین کە دەکرێن بە چەند بەشێکەوە..

بەڵێ، هەروەك مرۆڤ نەتەوەیەکە جێبەجێ کردنی ئەو فەرمان و شـەریعەت و یاسـایانەی لـە ئەسـتۆ نـراوە کـە لـە کانگـای سـیفەتی: "الکـلام"ی خـواوە هـاتوون، مەلائیکـەتیش نەتەوەیـەکی هێنــدە گـەورە و زۆرن، کـە تەنـها تـاقمی کارگێڕانیـان ئـەو فـەرمان و یاسـا "تەکوینی"یانەی خواوەند جێبەجێ دەکەن کـە لـە سـەرچاوەی سیفەتی: "الإرادة"ی خـواوە هاتوون. مەلائیکەت جۆرێکن لەو بەندە گوێڕایەڵانەی خواوەند کە هەمیشە لـە بەجێـهێنانی فەرمانەکانی ئـەودان، بە ڕادەیـەکی وا کـە هەریەکـە لـەو قەبارانـەی ئاسمانیـان کـردووە بـە مزگەوت و پەرستگای خۆیان.

## بنچینەی سێهەم

مەسەلەی بوونی مەلائیکەت و جیـهانی ڕۆحـانی، یەکێکـە لـەو مەسـەلانەی کـە ئـەم یاسـا مەنتیقی‌یە دەیگرێتەوە کە دەڵێت:

(سەلماندن و پێزانینی بەشێك لە هەر شتێك، بەسە بـۆ سـەلماندن و پێزانینی سـەرجەمی ئـەو شتە)!

واتە: بە بینینی "یەکێك" لە مەلائیکـەت لـە لایـەنی کەسێکەوە، دەزانرێـت کـە "جـۆر"ی مەلائیکەت هەن، چونکە نەسەلماندنی بوونی یەکێك مانای نەسەلماندنی هەموویانە. جا ئەگـەر مرۆڤ بوونی یەکێکی لەوان سەلماند، دەبێ هەمووشیان بسەلمێنێت..

کەواتە سەرنج بدە:

ئایـا نـەتبینیوە و نەتبیستووە کـە هـەموو خـاوەن ئایینـەکانی هـەموو سـەردەمێك، هــەر لــە سەردەمی ئـادەم پێغەمبـەرەوە - درووودی لەسـەر بێـت - تـا ئـەمڕۆ، هـەموویان بـە یـەك دەنـگ

ده‌ڵێن: "مه‌لائیكه‌ت" و "جیهانی ڕۆحانی" هه‌ن؟ هه‌روه‌ها به‌شێك له‌ مرۆڤه‌كانیش قسه‌یان له‌سه‌ر ئه‌وه‌ یه‌كانگیر بووه‌ كه‌ ده‌گونجێت مه‌لائیكه‌تان ببینرێن و قسه‌یان له‌گه‌ڵدا بكرێت و قسه‌یان لێ وه‌ربگیرێت؟

ئایا ئه‌گه‌ر له‌ ڕاستی‌دا یه‌كێك له‌ مه‌لائیكه‌تان نه‌بینرابایه‌، یان به‌ جۆرێكی بێ گومان نه‌زانرابایه‌ كه‌ مه‌لائیكه‌ت هه‌یه‌، چۆن ئه‌م "یه‌كده‌نگی"و یه‌ك قسه‌یی‌یه‌ی ئه‌وان - كه‌ به‌ "ته‌واتور" پێمان گه‌یشتووه‌ - له‌ بابه‌تێكی ئاوا "وجوودی" و "ئیجابی"دا[1] ڕووی ده‌دا؟ یان چۆن تا ئێستا به‌ به‌رده‌وامی ده‌مایه‌وه‌؟ ئایا ده‌گونجێ ئه‌م بیروباوه‌ڕه‌ گشتی‌یه‌ له‌ چه‌ند بنه‌مایه‌كی زه‌رووری و به‌دیهی‌یه‌وه‌ په‌یدا نه‌بوو بێت؟ ئایا ده‌گونجێت خه‌یاڵێك، كه‌ له‌ ڕاستی بێ‌به‌ش بێت، له‌ناو بیر و باوه‌ڕه‌كانی درێژایی مێژووی مرۆڤ و له‌ نێوان ته‌پاوتلی ڕووداوه‌كانی دنیادا هه‌روا وه‌ك خۆی بمێنێته‌وه‌؟

ئایا ده‌گونجێت ئه‌م یه‌كده‌نگی‌یه‌ گه‌وره‌ و گرنگه‌ی خاوه‌ن ئایینه‌كان پشتی به‌ چه‌ند به‌ڵگه‌یه‌كی عه‌قلی و یه‌قینی بێ گومان و بینراو نه‌به‌ستبێت؟.. ئایا ده‌گونجێت ئه‌م به‌ڵگه‌ عه‌قلی و یه‌قینی‌یه‌ بینراوانه‌ش پشتیان به‌ چه‌نده‌ها به‌ڵگه‌ و نیشانه‌ی جۆراوجۆر نه‌به‌ستبێت و، ئه‌م نیشانه‌ و به‌ڵگانه‌ش پشتیان به‌ بینین و "شهوود"ی واقیعی نه‌به‌ستبێت و، ئه‌م بینینه‌ش پاڵی به‌ چه‌ند بنه‌مایه‌كی گومانلێ‌نه‌كراوی یه‌قینی‌یه‌وه‌ نه‌دابێت؟

كه‌واته‌ ئه‌م بیروباوه‌ڕه‌ گشتی‌یه‌ی خاوه‌ن ئایینه‌كان پشتی به‌ چه‌ندین بنچینه‌ و بنه‌مای زه‌رووریی ئه‌وتۆ به‌ستووه‌ كه‌ ئه‌وانیش سه‌ریان له‌و ته‌واتوره‌ مه‌عنه‌وی‌یه‌وه‌ هه‌ڵداوه‌ كه‌ له‌ بینینی چه‌ندین جاره‌ی مه‌لائیكه‌ت و ڕۆحانی‌یه‌كانی تره‌وه‌ پێدا بووه‌. دیاره‌ ئه‌مانه‌ش چه‌ند بناغه‌یه‌كی ئه‌وتۆن كه‌ گومانیان لێ ناكرێت.

ئایا ئیتر ده‌كرێت هیچ شوبهه‌ و گومانێك ئاوێته‌ی هه‌واڵدان و بینینی ئه‌و پێغه‌مبه‌ر و پیاوچاكانه‌ بێت كه‌ به‌ "ته‌واتور" و یه‌كده‌نگی له‌ باره‌ی بوونی مه‌لائیكه‌ته‌وه‌ دواون و باسیان كردووه‌؟ له‌ كاتێكدا كه‌ ئه‌و پێغه‌مبه‌ر و پیاوچاكانه‌: خۆر و ئه‌ستێره‌ی تیشك به‌خشی ژیانی كۆمه‌ڵایه‌تیی مرۆڤایه‌تین و، به‌ تایبه‌تی ئه‌وان له‌م بابه‌تانه‌دا پسپۆڕی ئه‌م بواره‌ن، كه‌ شتێكی ئاشكرایشه‌ وته‌ی دوو پسپۆڕی بابه‌تێك به‌سه‌ر وته‌ی هه‌زارانی تردا سه‌رده‌خرێت[2].. هه‌روه‌ها ئه‌وان له‌م مه‌سه‌له‌یه‌دا لایه‌نی چه‌سپێنه‌ر(أهل الاثبات)ن، له‌ كاتێكدا كه‌ ئاشكرایه‌

---

(١) واته‌: بابه‌ته‌كه‌ بابه‌تی "ئیجابه‌" نه‌ك "نه‌فی". دیاره‌ تا بابه‌تی ئیجابی وه‌ستابێت بایه‌خ به‌ بابه‌تی نه‌فی نادرێت. چونكه‌ بابه‌تی ئیجاب "به‌ڵگه‌" ده‌یكات به‌ ئیجاب، به‌ڵام نه‌فی بێ به‌ڵگه‌یه‌! (وه‌رگێر)

(٢) بۆ نموونه‌: له‌ ده‌ستنیشان كردنی نه‌خۆشی‌یه‌كدا قسه‌ی پزیشكێك به‌سه‌ر قسه‌ی هه‌زاران ئه‌ندازیاردا پێش‌ده‌خرێت. (وه‌رگێر)

وتەی دوو کەس لە چەسپێنەران وەردەگیرێت و قسەی هەزاران نەسەلمێنەر پشت گوێ دەخرێت[1].

ئایا دەگونجێت هیچ گومانێك خۆی بگەیەنێتە ئەم مەسەلەیە، لە کاتێکدا ئەو قورئانە پیرۆزە خاوەن ئیعجازەی کە لە ئاسمانی بوونەوەراندا هەمیشە بە بێ ئاوابوون دەدرەوشێتەوە، باسی کردووە و لێی دواوە؟ یاخود لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ کە خۆری پرشنگداری ئەم ئایینەیە، دیویەتی و شایەتیی لەسەر داوە؟

جا لەبەر ئەوەی چەسپاندنی تاکێك لەوانەی جیهانی ڕۆح - لە هەر کاتێکدا - دەبێت بە بەڵگە لەسەر بوونی هەموو جۆرەکە - وەك لە ڕاستیدا ئەمە چەسپاوە - کەواتە جوانترین شێوە و چۆنێتی کە لە عەقڵ و ژیرییەوە نزیك بێت و باسی بوونیان بکات، دەبێت ئەوەبێت کە شەریعەتی ئیسلام و قورئانی پیرۆز باسیان کردووە و، خاوەنی میعراجیش ﷺ دیویەتی.

# بنچینەی چوارەم

ئەگەر سەرنج لە بوونەوەرانی ئەم گەردوونە بدەین، دەبینین:

"ئەو شتانەی کە هەمەکین(الکلیات) بە وێنەی هەندەکییەکان(الجزئیات) کەسێتییەکی مەعنەوییان هەیە، بە جۆرێك کە فەرمانبەرێتیی گشتیی ئەوان دەربخات".

بۆ نموونە: هەروەك "گوڵ" لە ڕێگەی دەرخستنی وردەکاریی دروستکردنیەوە، بە زمانی حاڵ تەسبیحاتی ناوەکانی بەدیهێنەری خۆی دەکات، هەموو باخچەکانی سەر ڕووی زەویش، لە ڕوانگەی ئەم گوڵەوە، فەرمانبەرییەکەیان بریتییە لە تەسبیحاتێکی گشتی لەوپەڕی ڕێکوپێکیدا..

هەروەك بەری درەخت بە ڕێکوپێکییە بێوێنەکەی، تەسبیحات و پەرستشی خۆی دەردەبڕێت، بە هەمان جۆر درەختیش - بە گشتی - فەرمانبەری و پەرستشێکی سروشتیی هەیە لەوپەڕی ڕێسا و ڕێکوپێکیدا.

جا هەروەك درەخت بەو جۆرەی کە باس کرا و، بە وشەی گەڵا و بەروبووم و گوڵەکانی، تەسبیحات و سوپاسی خوای خۆی دەکات، هەر بەو چەشنەیش هەموو ئاسۆ و سووچ و کەنارێکی ئاسمان، بە ئەندازەی وشەی "خۆر و، مانگ و، ئەستێرەکان"

---

(١) وەك لە بینینی مانگی یەكشەوە(هلال)ی ڕەمەزان و جەژندا قسەی دوو شایەت وەردەگیرێت، بەڵام نەبینینی هەزاران کەسی تر ناکرێت بە شایەت و قسەیان پشت گوێ دەخرێت. (وەرگێڕ)

تەسبیحات و سوپاسی خوای بەدیهێنەری دانای خۆیان دەکەن.. هەروەها هەموو ئەو بوونەوەرانەی بوونی دەرەکی‌یان هەیە - هەرچەند لە ڕواڵەتدا ڕەق و بێ گیان دیارن - ئەوانیش بەوپەڕی هەست و شعوورەوە، ئەرك و تەسبیحات و سوپاسگوزاری و پەرستشی خۆیان هەیە و بەجێ‌یان دەهێنن.

جا لەکاتێکدا کە "مەلائیکەت" لە جیهانی شارراوەی "مەلەکووت و غەیب"دا نوێنەری تەسبیحاتی بوونەوەرانن، لە هەمان کاتدا بوونەوەرانیش لە حوکمی مزگەوت و پەرستگای ئەو مەلائیکەتانەدان لە جیهانی بینراوی "مولك و شەهادەت"دا.

لە "لقی چوارەمی وتەی بیست و چوارەم"دا، ڕوونمان کردووەتەوە کە:

خاوەن و بەدیهێنەری ئەم کۆشکەی جیهان، بۆ مەبەستی ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەی خۆی چوار جۆر کرێکار بەکار دەهێنێت و دەیانخاتە سەر کار، کە لە پێشەکیی ئەم چوار جۆرە کارگوزارەوە مەلائیکەت و جیهانی ڕۆحانین.

"ڕووەك و بێ گیانەکان(الجمادات)" کە کاروباری خۆیان ئەنجام دەدەن، هیچ ئاگایەکیان لە مەبەستی خاوەنی ئەو کۆشکە نی‌یە و، بە بێ چاوەڕوانی کردنی وەرگرتنی هیچ پاداشتێك لە بەرامبەر ئەو کار و فرمانانەی کەوتووەتە ئەستۆیانەوە، کاری خۆیان جێبەجێ دەکەن، بەڵام بە فەرمانی یەکێك ئەنجامی دەدەن کە ئاگای لە ئامانج و مەبەستی خاوەنەکەیانە.

"ئاژەڵەکانیش" بە بێ ئەوەی لە ئامانجی خاوەنی ئەم کۆشکەی جیهان ئاگادار بن، کاروباری خۆیان ئەنجام دەدەن، بەڵام ئەوەندە هەیە پاداشتێکی کەمیان دەدرێتێ..

"گرۆی مرۆڤیش" کاتێ لە چەند ئیشێکدا دەخرێنە کار، هەست بە ئامانجی بەدیهێنەری شکۆمەند و خاوەنی ئەم کۆشکە دەکەن لەو کار و ئەرکانەدا، ئەمەش لە بەرامبەر وەرگرتنی دوو جۆر پاداشتی نزیك و دوور (دنیا و ئاخیرەت)، جگە لەوەی کە مرۆڤ لە هەر شتێکدا بەشی خۆی وەردەگرێت و، چاودێریی کارمەندانی تریش: (واتە: ڕووەك و ئاژەڵەکان) دەکات.

جا مادەم بەکارهێنانی ئەم سێ جۆرە کارمەندانە لە ئاوەدانکردنەوەی کۆشکی گەردووندا شتێکی ئاشکرا و دیار و بێ گومانە، دەبێ جۆرێکی تری چوارەم ببێت کە لە پێشەکیی جۆرەکانی ترەوە بێت. ئەوانیش لەوەدا لەگەڵ مرۆڤ یەك دەگرنەوە کە هەردوو لایان مەبەست و ئامانجی خاوەنی ئەم کۆشکە دەزانن، بەڵام لەوەدا لە یەکتر جیا دەبنەوە کە پەرستشی ئەمان هیچ بەشێکی خۆیانی تێدا نی‌یە و بەبێ وەرگرتنی هیچ پاداشتێك کاروباریان ئەنجام دەدەن. چونکە ئەوان بە دوای پاداشتی تایبەتی‌دا ناگەڕێن و، ئەوەندەیان بەسە کە

هەست دەکەن و دەزانن خواوەند لێیانەوە نزیکە و چاوی ڕەحمەت و میهرەبانیی لێیانە و، لەزەت و خۆشی لەوەدا دەبینن کە فەرمانەکانی خواوەند جێبەجێ دەکەن. لەبەر ئەوە، هەر کاروبارێکیان پێ دەسپێررێت، بەوپەڕی دڵسۆزی و لێبڕانەوە جێبەجێی دەکەن.. ئەمانەش پێیان دەوترێت: "مەلائیکەت".

جا ئەم مەلائیکەتانە، بە گوێرەی دەستە و تاقم و جۆرەکانی خۆیان و ڕەگەز و جۆرەکانی بوونەوەران، فەرمانبەری و کاروباریان جۆراوجۆر و لە یەکتر جیاوازە. هەروەك فەرمانگەکانی دەوڵەت هەریەکەیان کارمەندی و فەرمانبەرێتی‌یەکی تایبەتی‌یان هەیە، هەر بەو جۆرەش فەرمانبەرێتیی فەرمانگەکانی پەروەردگارێتیی خوا و ئەو پەرستشانەی پێشکەشی ئەو دەکرێن، لە یەکتر جیاوازن و هەریەکەیان بە چەشنێکی تایبەتی‌یە.

بۆ نموونە: حەزرەتی میکائیل - دروودی لەسەر بێت - بە فەرمانی خوا و لە پێناوی ئەودا، وەك چاودێرێکی گشتی وایە - گەر ئەم تەعبیرە دروست بێت - بەسەر هەموو ئەو بەدیهێنراوانەی خواوەندەوە کە لەسەر ڕووی زەوی‌دا چێنراون. واتە وەك سەرکردەیەکی ئەو مەلائیکەتانە وایە کە کاروباری ڕووەکەکانیان دراوەتە دەست..

هەروەها خوای گەورە مەلائیکەتی تری هەیە سەرکردەیی ئەو مەلائیکەتانەی پێ سپێرراوە، کە بوون بە چەند شوانێکی چاودێری مەعنەویی سەرجەم گیانلەبەرە جۆراوجۆرەکان.

جا مادەم بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە هەر جۆرێك لە بوونەوەرە ئاشکراکان مەلائیکەتێکیان هەیە و، لە جیهانی مەلەکووتدا نوێنەری پەرستشەکانیانە و - بە زانین و ئاگا لێبوونەوە - لەوێ پەرستشەکانی ئەوان پێشکەشی خواوەند دەکات، ئەوا دەبێت لەم ڕێگایەوە لەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ تێبگەین، کە لە بارەی مەلائیکەتەوە فەرموونی و لەم ڕووەوە وێنەیەکی وردی جوانی ئەوتۆی کێشاوە کە زۆر شیاو بێت و تابڵێی لە عەقڵەوە نزیك بێت. وەك ئەوەی لە "واتا"ی یەکێك لە فەرموودەکانی‌دا دەفەرموێت:

(خوای گەورە مەلائیکەتێکی هەیە، چل - یاخود چل هەزار - سەری هەیە، هەریەك لەو سەرانە چل هەزار دەمی هەیە، هەر دەمێك چل هەزار زمانی هەیە، هەریەك لەم زمانانەش چل هەزار جۆر ویرد و تەسبیحاتی تایبەتی‌یان هەیە).

"ڕاستی"ی ئەم فەرموودەیە، ڕوخسار و ناوەرۆکی هەیە..

ناوەرۆکەکەی بریتی‌یە لەوەی کە: پەرستشی مەلائیکەتان لەوپەڕی ڕێکوپێکی و کەماڵ و فراوانی و گشتی‌دایە.

سەبارەت بە شێوە و ڕوخسارەکەشی، ئەوا بریتی‌یە لەوەی کە: هەندێ لە بەدیهێنراوە گەورەکانی خوای کردگار بە چل هەزار سەر و بە چل هەزار شێوە فەرمانبەریی پەرستش بەڕێوە دەبەن..

بۆ نموونە: دەبینین پەرستشی "ئاسمان" بریتی‌یە لە تەسبیحات کردن بە وشەی "خۆر" و "ئەستێرەکان". هەروەها "زەوی"ش هەرچەند تەنهایە، بەڵام بە سەد هەزار سەر پەرستشی خۆی پێشکەش دەکات و، هەریەك لەو سەرانەش بە سەدان هەزار دەم و، هەریەك لەو دەمانەش بە سەدان هەزار زمان ستایش و پەرستشی خوای خۆیان دەکەن..

جا بۆ ئەوەی ئەو مەلائیکەتەی کە کاروباری "زەوی"ی پێ سپێرراوە بتوانێت ئەم واتا و ناوەرۆکە لە جیهانی شارراوەی "مەلەکووت"دا دەربڕێت، دەبێت هەر بە هەمان شکڵ و ڕوخساریش لەوێ دەربکەوێت.

ئەمەشت بەلاوە سەیر نەبێت، من خۆم جارێکیان نزیکەی چل لقم - کە لەسەر بچێت- بە درەختێکی مامناوەندیی "چواڵە"وە ژمارد، کە تەماشای یەکێك لەو لقانەم کرد، نزیکەی چل پەلی بچووکم ژمارد کە لە "سەر" دەچوون و لەو لقە بووبوونەوە، پاشان چل دانە گوڵم بە یەکێك لەو پەلانەوە ژمارد کە هەموویان "دەم"یان کردبووەوە، کە سەرنجم لەو گوڵانەشدا بینیم هەریەکەیان نزیکەی چل تاڵی باریکی ڕەنگاوڕەنگیان بەسەردا بڵاو بووبووەوە، بە جۆرێك کە هەریەکەیان درەوشانەوەی یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوایان دەدایەوە و ڕوونیان دەکردەوە و دەیانخستە گوفتار.

جا ئایا دەگونجێ خواوەندی بەدیهێنەری شکۆمەند و جوان و دانا و خاوەنی پەروەردەکاری درەختی چواڵە، لە کاتێکدا ئەم درەختەی بەم شێوە و ڕوخسارە دروست کردبێت و ئەو هەموو کار و ئەرکانەی پێ سپاردبێت، پاشان مەلائیکەتێك، کە لەگەڵی‌دا بگونجێت و وەك ڕۆحی ئەو درەختە وابێت، نەکات بە سەرپەرشتیکاری و، ئەو مەلائیکەتە واتا و ناوەرۆکی ئەو درەختە بە بوونەوەران نەگەیەنێت و پەرستشەکانی پێشکەشی خوای گەورە نەکات؟!

* * *

هاوڕێی ئازیزم!

ئەمەی تا ئێستا باسمان کرد، تەنها سەرەتایەك بوو ڕێگای تەخت و ئاسان کرد بۆ ئەوەی "دڵ" بۆ وەرگرتن ئامادە بێت و، "نەفس" بۆ تەسلیمبوون ملکەچ بێت و، "عەقڵ"یش هیچ سەرپێچی‌یەکی نەمێنێت و سەر بۆ "ڕاستی" دابنەوێنێت..

جا ئەگەر لەمانەی پێشوو تێگەیشتوویت و حەز دەکەیت بە "مەلائیکەت" بگەیت و پێیان شاد بیت، ئەوا پێش هەموو شتێك خۆت لە هەموو خەیاڵێکی نزم وخراپ پاك بکەرەوە. پاشان بزانە کە بەهەشتی ڕازاوەی زانیاری‌یەکانی قورئانی پیرۆز هەمیشە دەرگای لەسەر پشتە، تۆش فەرموو بڕۆرە ناویەوە و لەم بەهەشتە ڕازاوەیەی قورئانی پیرۆزدا سەیری جوانترین شێوەی مەلائیکەت بکە، چونکە هەریەکە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز پەنجەرە و کلاوڕۆژنەیەکی ڕووناکە. دەسا تۆش فەرموو لەوێ ڕابووەستە و.. سەیر بکە و.. لەزەت بچێژە و سوود وەربگرە:

﴿والْمُرسَلاتِ عُرْفاً ۞ فَالْعَاصِفاتِ عَصْفاً ۞ والنّاشِراتِ نَشْراً ۞ فَالْفَارِقاتِ فَرْقاً ۞ فالْمُلقياتِ ذِكْراً﴾ (المرسلات:١-٥).

﴿والنَّازِعاتِ غَرْقاً ۞ وَالنَّاشِطاتِ نَشْطاً ۞ وَالسَّابِحَاتِ سَبْحاً ۞ فالسَّابِقاتِ سَبقاً ۞ فَالْمدبِّراتِ أمْراً﴾ (النازعات:١-٥).

﴿تَنَزَّلُ الْملائكةُ وَالرُّوحُ فيها بِإذنِ ربِّهِمْ﴾ (القدر:٤).

﴿... عَلَيْهَا مَلائِكَةٌ غِلاظٌ شِدَادٌ لا يَعْصُونَ اللهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ (التحريم:٦).

پاشان گوێ بۆ ستایشیان ڕابگرە:

﴿سُبْحانَهُ بَلْ عِبادٌ مُكْرَمُونَ ۞ لا يَسْبِقُونَهُ بالْقَولِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ﴾ (الأنبياء:٢٦-٢٧).

ئەگەر حەزیشت لە موقابەلەکردنی جینني‌یە، ئەوا بچۆرە ناو قەڵای سوورەتی:

﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ..﴾ (الجن:١).

پاشان گوێ بۆ قسەکانیان ڕابگرە و پەند وەربگرە، بزانە دەڵێن:

﴿... إِنَّا سَمِعْنَا قُرآناً عَجَباً ۞ يَهْدي إِلى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَداً﴾ (الجن:١-٢).

# مەبەستی دووهەم

## لە بارەی: "مردنی دنیا" و "بەرپابوونی قیامەت" و "ژیانی دوارۆژە"وە دەدوێت

(ئەم مەبەستە پێشەکییەك و چوار بنچینەی سەرەکیی تێدایە)

## پێشەکی

ئەگەر یەکێك ئیددیعای ئەوەی کرد کە: ئەم شارە، یان ئەم کۆشکە، دەڕووخێنرێت و، پاشان سەرلەنوێ بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بنیات دەنرێتەوە و ئاوەدان دەکرێتەوە، ئەوا ئەو کاتە شەش پرسیار ڕوو لەم ئیددیعایەی دەکات:

پرسیاری یەکەم: بۆچی دەڕووخێنرێت و بیانووی ئەم ڕووخاندنە چییە؟

ئەگەر وەڵامی ئەمەی بە ئیجابی دایەوە، پرسیاری دووهەم خۆی ئاراستە دەکات کە:

ئایا ئەو کەسەی دەیڕووخێنێت و پاشان دروستی دەکاتەوە، توانای ئەم کارەی هەیە؟

جا ئەگەر سەلماندی کە بەتوانایە، پرسیاری سێهەمی لێ دەکرێت کە:

ئایا دەگونجێ بڕووخێنرێت؟

پاشان پرسیاری چوارەم دێتە پێش کە:

ئایا لە "ڕاستی"دا دەیڕووخێنێت؟

جا ئەگەر ئەمانەشی چەسپاند، دەمێنێتەوە دوو پرسیاری تر:

ئایا دەگونجێ ئەم شارە یان ئەم کۆشکە سەر لە نوێ بنیات بنرێتەوە؟ ئەگەر ئەمەش دەگونجێ، ئایا لە "ڕاستی"دا ئاوەدانی دەکاتەوە؟

جا ئەگەر بە (بەڵێ) وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە و، هەموو ئەمانەی چەسپاند، ئەوا هیچ گومانێك ڕوو ناکاتە ئەم مەسەلەیە و هیچ کەلێنێکی تێدا نامێنێتەوە.

لە ڕۆشنایی ئەم نموونەیەوە دەتوانین بڵێین کە:

هۆکارێك هەیە بۆ ڕووخاندنی کۆشکی دنیا و شاری بوونەوەران و، پاشان بۆ ئاوەدان کردنەوەشی. یەکێکیش هەیە ئەم کارەی لە توانادا بێت، هەر لەبەر ئەوەشە کە دەتوانێت

بیرووخێنێت و تازەیشی بکاتەوە، هەروەك لە ڕاستیشدا ئەم کارانە دەکات و ئەنجامیان دەدات.

ئەم مەسەلانەش پاش "بنچینەی یەکەم" بە باشی بۆمان دەچەسپێنن و ڕوون دەبنەوە.

# بنچینەی یەکەم

بێ گومان "ڕۆح" نەمرە و هیچ شوبهەیەك لەمەدا نییە، چونکە ئەو بەڵگانەی کە لە "مەبەستی یەکەم"دا بوونی مەلائیکەت و ڕۆحانیاتیان چەسپاند، لە هەمان کاتدا بەڵگەی مەسەلەی مانەوە و نەمریی "ڕۆح"یشن.

من خۆم لەو باوەڕەدام کە ئەم مەسەلەیە ئەوەندە ئاشکرایە ڕوونکردنەوەی کارێکی زیاد لە پێویستە!

بەڵێ، ئەو ماوە(مسافة)یەی لە نێوان ئێمە و ئەو کاروانە لەژمارەبەدەرانەدایە کە کۆچیان کردووە و لە جیهانی ڕۆح و بەرزەخدان و چاوەڕێی کۆچ کردنن بۆ قیامەت، ئەو ماوەیە گەلێ ورد و کەم و کورتە. ئەمەش ئەوەندە ڕوونە کە پێویستیی بە هیچ ڕوونکردنەوە و بەڵگەهێنانەوەیەك نییە..

چونکە ئەو دیدار و پەیوەندییانەی ئەوان لەگەڵ ئەهلی "کەشف و شهوود"دا و بینینیان لە لایەن ئەوانەی کە قەبریان بۆ کەشف دەبێت و، پەیوەندیی زۆربەی خەڵکی پێیانەوە و وتووێژیان لەگەڵیاندا لە خەونە ڕاستەکان(الرؤيا الصادقة)یاندا، هەموو ئەمانە، بەهۆی زۆریی تەواتورەوە، مەسەلەی مانەوە و نەمریی ڕۆحیان کردووە بە مەسەلەیەکی ئەوتۆ کە هەموو مرۆڤایەتی لێی تێ گەیشتووە.

بەڵام لەم چەرخەی ئێمەدا بیری ماددی بەشێکی زۆری مرۆڤی سەرسام و سەرگەردان کردووە، بە ڕادەیەك کە گومانی لە ئاساییترین شتی "بەدیهی"شدا بڵاو کردووەتەوە.

جا لەبەر لابردنی ئەم لەکە و گومانانە، پەنجە بۆ "چوار سەرچاوە" درێژ دەکەین، لە نێوان ئەو سەرچاوە زۆر و زەبەندانەی کە بۆمان ڕوون دەکەنەوە: ئەم مەسەلەیە لە لایەن ژیری و دڵ و دەروونەوە مەسەلەیەکی مەنتیقی و سەلمێنراوە.

وا ئێستا بە نووسینی "سەرەتایەك" ڕێگا بۆ ئەو چوار سەرچاوەیە خۆش دەکەین. ئنجا دێینە سەر باسی هەر چوار سەرچاوەکە.

**سەرەتا:**

وەك لە ڕاستیی چوارەمی "وتەی دەهەم"(پەیامی حەشر)دا چەسپاندمان:

"جوانی"ی بێ وێنە و هەمیشەیی، داخوازی ئەوەیە "شەیداکان"یشی، کە وەك ئاوێنە وان و ئەو جوانی‌یەیان تێدا دەردەکەوێت، هەمیشەیی بن.. هەروەها هەر "سنعەتێکی کاملی ڕێکوپێك"، داخوازی ئەوەیە چەند کەسێك ببن "باسی بکەن و لێی تێ‌بفکرن".. هەروەها "میهرەبانی و چاکەی" هەمیشەیی و نەبڕاوەش، داخوازی ئەوەن کە ئەوانەی موحتاجی ئەو نیعمەتانەن و "شوکرانەبژێریی دەکەن"، هەمیشە لەو نیعمەتانەدا بن.

جا ئەو "شەیدایە"ی کە وەك ئاوێنەی بێ گەرد وایە و، ئەو "باسکەرەی کە لە تێفکریندایە" و، ئەو "شوکرانە بژێرە"ی کە موحتاجی ئەو نیعمەتانەیە، پێش هەموو شتێك، بریتی‌یە لە: "ڕۆحی مرۆڤ"! هەر لەبەر ئەوەشە کە ڕۆحی مرۆڤ بە درێژایی ڕێگای هەمیشەیی و نەمری لەگەڵ ئەو "جوانی و، ڕێکوپێکی و، ڕەحمەتە نەبڕاوەیە"دا نەمر و هەمیشەیی‌یە!

لە ڕاستیی شەشەمی "وتەی دەهەم"یشدا ئەوەمان چەسپاند کە:

وەنەبێ تەنها ڕۆحی مرۆڤ نەمر و هەمیشەیی بێت و بۆ نەفەوتان دروست کرابێت، بەڵکو ئاسایی‌ترین بەدیهێنراوانی تریش بۆ لەناوچوون دروست نەکراون، بەڵکو جۆرە مانەوەیەکی تایبەتی‌یان هەیە. بۆ نموونە: گوڵێکی ئاسایی، کە وەك ئێمەش گیاندار نی‌یە، دەبینین کاتێ دەڕوات و لە بەرچاودا نامێنێت، شێوەکەی لە چەندین مێشك و زەیندا دەمێنێتەوە، هەروەك یاساکانی پێکهاتنی خۆی لە سەدان تۆودا بەجێ دەهێڵێت و، دەبێتە نموونەیەك کە هەزاران جۆری مانەوە و هەمیشەیی، دەردەخات.

جا مادەم "شێوە"ی ئەم گوڵە و "یاساکانی پێکهاتنی" کە تا ئەندازەیەك لە "ڕۆح" دەچن (واتە: ئەو یاسایانە) بەم جۆرە خواوەندی دانا و پارێزەر(الحفیـظ) بەوپەڕی ڕێکوپێکی بیانپارێزێت و، لە نێوان ئەو هەموو ئاڵوگۆڕە زۆرانەی دێنە ڕێی تۆوەکان، لەو تۆوە هەرە بچووکەدا هەڵیان بگرێت، دەبێ ڕۆحی مرۆڤ کە یاسایەکی "ئەمری"ی نوورانی‌یە و، چی‌یەتی‌یەکی بەرزی هەیە و، خاوەنی هەست و شعوور و تایبەتکاری‌یەکی گشتی‌یە و، بوونێکی "دەرەکی"شی هەیە، دەبێ بە بێ هیچ گومانێك ئەم ڕۆحەی مرۆڤ – کە زۆر لەگەڵ هەمیشەیی‌دا پەیوەندیدارە – بۆ هەمیشەیی و نەمری دروست کرابێت!

جا ئەگەر لەمە تێ‌نەگەیت، چۆن خۆت بە مرۆڤێکی تێگەیشتوو لە قەڵەم دەدەیت؟

ئیتر خوایەك ئەوەندە شکۆمەند و پارێزەر و باقی و دانا بێت، کە نەخشەی درەختێکی گەورە و یاساکانی پێکهاتنی – کە لە ڕۆح دەچن– لە بچووکترین تۆودا بپارێزێت و هەڵی بگرێت، چۆن پرسیار دەکرێت کە: (ئایا ئەم خوایە چۆن دوای مردنی مرۆڤ ڕۆحی دەپارێزێت و هەڵی دەگرێت؟) چۆن؟!

◆ **سەرچاوەی یەکەم:** خۆیەتی(ئەنفوسی)یە

واتە هەر کام لە ئێمە ئەگەر سەرنجێك لـە خـۆی بدات و بـە وردی سەیری خـودی خـۆی بکات، بۆی دەردەکەوێت کە ڕۆحێکی هەمیشەیی هەیە.

بەڵێ، ئاشـکرایە کـە هـەموو ڕۆحێـك هەرچـەند بـە درێژایـی سـاڵانی تەمـەن لـەشی خـۆی دەگۆڕێت، بەڵام ئەو ڕۆحە هەر دەمێنێتەوە و هیچی بەسەردا نایەت. ئەمەش ئەوە دەگەیـەنێت کە کاتـێ لـەش بـە تـەواوی دەمرێـت، ڕۆح هـەر وەك خـۆی دەمێنێتـەوە و هیـچ ئـاڵوگۆڕێکی بەسەردا نایەت. واتە هەر ئاڵوگۆڕێك بەسـەر لەشـدا تێپـەڕ ببێـت، هیـچ کـارێك ناکاتـە سـەر ڕۆح و ئەو لە جێگای خۆیدا هەر دەمێنێتەوە، چونکە ئەوەی ڕوو دەدات تەنها ئەوەندەیە کـە لەش بەرگەکانی خۆی دەگۆڕێت و، هیچ ئاڵوگۆڕێك بەسەر ڕۆحدا نایەت. بەڵام لـە مردنـدا لەش دادەماڵرێت و ڕۆح بە سەربەخۆیی دەمێنێتەوە.

ئێمە لەوەدا بێ گومانین، بەڵکو لە ڕێگای بینینەوە دەزانین کە:

"لـەش" بـە ڕۆحـەوە بـەندە، نـەك بـە پێچەوانـە "ڕۆح" بە لەشـەوە بـەند بێـت. بـەڵکو ڕۆح قـەوارە(کیـان)ی تایبـەتی خـۆی هەیـە، کەواتـە لـەت لـەت بـوون و پاشـان یەکگرتنـەوەی ئەندامەکانی لەش، یان هەر ئـاڵوگۆڕێکی تـر کـە بەسـەر لەشـدا بێـت، بـە هیـچ جۆرێـك کـار ناکاتـە سـەر ڕۆح و سـەربەخۆیی‌یەکەی. چونکـە لـە ڕاستیدا لـەش بـەرگ و پۆشـاکی ڕۆح نی‌یە، بەڵکو خانە و لانە و نیشتەجێیەتی، بەڵام بەرگ و پۆشاکی ڕۆح بریتی‌یـە لـە بـەرگێکی تەنکی ناسك و تەنێکی میسالیی تا ڕادەیەك چەسپاو، بـە جۆرێکـی ئەوتۆ کـە لەگـەڵ ڕۆحـدا بگونجێ. هەر لەبەر ئەوەشە کە لە کاتی مردنی لەشدا ڕۆح بە تـەواوی ڕووت نـابێت، بـەڵکو لەناو بەرگە گونجاوەکەی خۆیدا دەمێنێتەوە.

◆ **سەرچاوەی دووهەم:** دەرەکی(ئافاقی)یە..

واتە لە بینین و تاقیکردنەوە و واقیعی زۆروزەبەندەوە پەیدا بووە.

بەڵێ، ئەگەر تێ گەیشتین لەوەی کە ڕۆح وەك "تاکێك" دەمێنێتـەوە، ئـەوا گومـان لـەوەدا نی‌یە کە وەك "جۆرێك"یش دەمێنێتەوە. چونکە هەروەك لە زانیاریی "مەنتیق"دا زانراوە:

(هەر تایبەتکاری‌یەك لە تاکێکدا بـوو، ئـەوا دەتوانـرێ بوترێـت لـە تێکـڕای جۆرەکـەیدا هەیە). چونکە تایبەتکاری‌یەکی خۆیی(خاصية ذاتية)یە. کەواتە دەبێ لــە هـەموو تاکـەکانیدا ببێت.

خۆ مەسەلەی مانەوەی ڕۆح نەك هەر لە تاکێکدا زانراوە و بەس، بـەڵکو ئـەو شـوێنەوار و ئاسەوارانەی کە لەسەر بناغەی بینین دەرکـەوتوون و، ئـەو بەڵگـە و نیشـانە زۆرانـەش کـە لـە ژمـارە نایـەن، هـەموویان بـە جۆرێکـی گومـان لـێ نـەکراو مانـەوەی ڕۆح دەچەسـپێنن، بـە ڕادەیـەکی ئەوتۆ کـە هـەروەك هیـچ گومانێکمـان نی‌یـە لـە بوونـی کیشـوەری ئـەمریکا ـ کـە

تازه‌كی دۆزراوه‌ته‌وه - و پڕبوونی له‌ دانیشتووان، به‌ هه‌مان جۆر هیچ گومانێكیشمان له‌وه‌دا نی‌یه‌ كه‌ (جیهانی ڕۆح و مه‌له‌كووت) پڕن له‌ گیانی ئه‌و مردووانه‌ی كه‌ كۆچیان كردووه‌ و، په‌یوه‌ندی‌یان له‌گه‌ڵماندا هه‌یه‌. چونكه‌ دیاری‌یه‌ مه‌عنه‌وی‌یه‌كانی ئێمه‌یان پێ ده‌گات و، ئێمه‌ش له‌ لێشاوی به‌ره‌كه‌ته‌كانی ئه‌وان به‌هره‌مه‌ند ده‌بین.

هه‌روه‌ها مرۆڤیش به‌ یه‌قینی هه‌ست ده‌كات كه‌ پایه‌ و لایه‌نێكی سه‌ره‌كی له‌ مرۆڤدا دوای مردنی هه‌ر ده‌مێنێته‌وه‌. ئه‌م لایه‌نه‌ش ڕۆحه‌. چونكه‌ ڕۆح هه‌ڵوه‌شانه‌وه‌ و تێكچوون ڕووی تێ ناكات، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ڕۆح شتێكی ساكار(بسيط)ه‌ و سیفه‌تی "تاك"ی هه‌یه‌، له‌ كاتێكدا كه‌ هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ و تێكچوون له‌ ڕێگای شتی پێكهاتوو(مركب)دایه‌، نه‌ك ساكار و تاك.

وه‌ك پێشتر باسمان كرد، ژیان جۆره‌ "یه‌كبوون"ێك له‌ناو زۆری‌دا دابین ده‌كات. ئیتر له‌م ڕێگایه‌وه‌ جۆره‌ مانه‌وه‌یه‌كی ده‌ست ده‌كه‌وێت. واته‌ "یه‌كبوون" و "مانه‌وه‌" دوو بناغه‌ی سه‌ره‌كین له‌ ڕۆحدا و، له‌وانه‌وه‌ په‌ره‌ ده‌سێنێت و ده‌ڕوات بۆ "زۆری".

له‌به‌ر ئه‌مه‌، له‌ناوچوونی ڕۆح: یان به‌ ڕووخاندن و شی بوونه‌وه‌ ده‌بێت، یان به‌ له‌ناوبردن!

سه‌باره‌ت به‌ یه‌كه‌میانه‌وه‌ شتێكی نه‌گونجاوه‌، چونكه‌ سیفه‌تی "یه‌كبوون" له‌ ڕۆحدا هیچ ڕێگایه‌ك به‌ ڕووخاندن و شی‌بوونه‌وه‌ نادات و، ساكاری‌یه‌كه‌شی ڕێگای تێكچوونی نادات. سه‌باره‌ت به‌ له‌ناوبردن و له‌ناوچوونیشی، ئه‌وا به‌زه‌یی ڕه‌ها و فراوانی خوای به‌خشنده‌، ئه‌و شته‌ی كه‌ به‌خشیویه‌تی نایسێنێته‌وه‌، كه‌ بریتی‌یه‌ له‌ به‌خشینی نیعمه‌تی "بوون" به‌ ڕۆحی مرۆڤ، ئه‌و ڕۆحه‌ی كه‌ شایسته‌ی بوونه‌ و هه‌رده‌م له‌ تاسه‌دایه‌ بۆی.

◆ **سه‌رچاوه‌ی سێهه‌م:**

ڕۆح یاسایه‌كی "ئه‌مری"[(١)] و زیندوو و هه‌ستیار و نوورانی‌یه‌ و، ڕاستی‌یه‌كی گشتیی هه‌یه‌ و، ده‌توانێت سیفه‌تی هه‌مه‌كی و ماهییه‌تی گشتی بگرێته‌خۆ، جگه‌ له‌وه‌ی كه‌ بوونی ده‌ره‌كیشی له‌به‌ر كراوه‌. چونكه‌ ئاشكرایه‌ كه‌ بێهێزترین یاسای "ئه‌مری" نه‌گۆڕان و هه‌میشه‌یی پێوه‌ دیاره‌، به‌وه‌دا كه‌ ئه‌گه‌ر سه‌رنج بده‌ین بۆمان ده‌رده‌كه‌وێت له‌ نێوان هه‌موو

---

(١) خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿إنما أمره إذا أراد شيئاً أن يقول له كن فيكون﴾ (يس:٨٢)، ﴿قل الرّوح من أمر ربّي﴾ (الاسراء:٨٥)، ﴿ألا له الخلق والأمر﴾ (الأعراف:٥٤). ئیمامی غه‌زالی - خوای لێ ڕازی بێت - سه‌باره‌ت به‌ ڕۆح ده‌فه‌رموێ: "وهو أمر عجيب رباني تعجز أكثر العقول عن درك حقيقته". بڕوانه:"إحياء علوم الدين" ج٣/ص٤. ئیمامی ڕه‌ببانیش - خوای لێ ڕازی بێت - ده‌فه‌رموێ: "پێنج شت هه‌ن پێیان ده‌وترێت: "الجواهر الخمسة الأمرية" كه‌ بریتین له‌: "القلب، الروح، السرّ، الخفي، الأخفى". پاشان ده‌فه‌رموێ: "والاطلاع على حقائقها (واته‌ حه‌قیقه‌تی ئه‌م پێنجه‌) إنما هو نصيب كُمَّلِ تابعي النبي ﷺ". بڕوانه: مكتوبات الإمام الرباني ج١/ص٤٨. (وه‌رگێڕ)

ئەو جۆرانە(أنواع)ی گۆڕانیان بەسەردا دێت، "ڕاستی"یەکی نەگۆڕاو و هەمیشەیی هەیە، چونکە ئەو جۆرانە هەرچەند ئاڵوگۆڕی زۆر ڕوویان تێدەکات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەو "ڕاستی"یە هەر دەژی و هەرگیز نامرێت و ناگۆڕێت.

جا ئەو یاسایانەی کە بەم چەشنە لە "جۆر"ەکانی زیندەوەراندا دێنەدی، هەروەها لە "تاك"ێکی مرۆڤیشدا دێنەدی، چونکە لەبەر ئەوەی چیەتیی مرۆڤ و، هەست و شعوور و، بۆچوونەکانی گشتی و فراوان و بەربڵاون، ئەوا "تاك"ی مرۆڤ لە حوکمی "جۆر"ی شتانی تردایە، با خۆی لە خۆیشیدا یەك دانە و تاك بێت. چونکە خواوەندی بەدیهێنەری دانا ئەم مرۆڤەی لە شێوەی ئاوێنەیەکی گشتیدا دروست کردووە و، ڕاستییەکی بەرز و پەرستشێکی تەواویشی پێ بەخشیوە.

کەواتە حەقیقەتی ڕۆح لە هیچ تاکێکی مرۆڤدا - بە ویستی خوا - نامرێت، با سەدان هەزار وێنە و شکڵ و شێوەش بگۆڕێت! ئیتر ڕۆحی هەموو یەکێکی مرۆڤ، وەك بە زیندوویی دەستی پێ کردووە، هەر وەهاش بە زیندوویی دەمێنێتەوە. کەواتە ڕۆح - کە لە ڕاستیدا بریتییە لە هەست و شعووری ئەو مرۆڤە تاکە و، ماك(عنصر)ی ژیانی ئەوە - بە ئیزن و هێشتنەوە و فەرمانی خوا، هەر هەمیشەیی دەبێت و دەمێنێتەوە.

◆ **سەرچاوەی چوارەم:**

ئەو یاسایانەی کە لە جۆرەکاندا کار دەکەن، تا ڕادەیەك لە "ڕۆح" دەچن، چونکە هەردووکیان لە جیهانی "ئەمر" و "ئیرادە"وە هاتوون. واتە: ئەو یاسایانە لەگەڵ ڕۆحدا بە ڕادەیەکی کەم یەكدەگرنەوە، ئەویش لەوەدا کە هەردووکیان لە یەك سەرچاوەوە هەڵقولاون.

جا ئەگەر سەرنج لەو یاسایانە بدەین کە لە جۆرەکاندا کار دەکەن و، هەستێکی دیاریان نییە، بۆمان دەردەکەوێت کە: ئەگەر ئەم یاسا ئەمرییانە بوونێکی دەرەکییان لەبەر بکرێت، ئەوا وەك ڕۆحیان لێ دێت بۆ ئەو جۆرانە. چونکە ئەو یاسایانە نەگۆڕاو و باقی و هەمیشەیین و هەر ئاڵوگۆڕێك لە جۆرەکاندا ڕوو بدات هیچ کارێك لەسەر ئەمان ناکات و یاساکان لەناو نابات. بۆ نموونە: ئەگەر دار هەنجیرێك پارچە پارچە بێ و نەمێنێ و بمرێت، ئەوا یاسای دروستبوون و گەورەبوونەکەی - کە وەك ڕۆحی وایە - لە تۆوەکەیدا - کە تابڵێی بچووکە - هەر دەمێنێتەوە و هەمیشەیی دەبێت. واتە: یەكبوون(وحدة)ی ئەو یاسایانە لە نێوان ئەو هەموو ئاڵوگۆڕانەدا نامرێت و تێکچوونی بەسەردا نایەت.

جا لە کاتێکدا ئاساییترین و لاوازترینی ئەو یاسایانەی کە لە بوونەوەردا کار دەکەن، بەم چەشنە پەیوەندیی گەرموگوڕی لەگەڵ مانەوە و هەمیشەییدا بێت، دەبێ ڕۆحی مرۆڤ نەك

هەر تەنها پەیوەندیی لەگەڵ مانەوەدا بێت، بەڵکو دەبێ هەتاهەتایە هەر هەمیشەیی و ئەبەدی بێت. چونکە ڕۆح، وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾ (الاسراء:٨٥) لە جیهانی "ئەمر"ەوە هاتووە و، یاسایەکی خاوەن هەست و ژیانە و، خوای گەورەی بەدەستەڵات بوونی خاریجیی پێ بەخشیوە.

کەواتە هەروەك ئەو یاسایانەی کە خاوەن هەست و شعوور نین و لە جیهانی "ئەمر" و سیفەتی "ئیرادە"وە هاتوون، هەمیشەیین، دەبێ ڕۆحیش کە وەك ئەو یاسایانە وایە و لە هەمان جیهانی "ئەمر" و سیفەتی "ئیرادە"وە هاتووە، هەمیشەیی بێت. تەنانەت ڕۆح لەو یاسایانە زیاتر شایستەی هەمیشەیی و مانەوەیە، لەبەر ئەوەی خاوەنی بوونێکی دەرەکییە و، لە یاساکان بەهێزترە و پلەی بەرزترە چونکە خاوەن هەستە، لە هەمووشیان بەردەوامتر و بەنرختر، چونکە خاوەن ژیانە.

# بنچینەی دووهەم

زیندووبوونەوە و ژیانێکی نوێ شتێکی پێویستە.. ئەو کەسەش کە ئەو ژیان و بەختیارییە هەمیشەییە دەبەخشێت خاوەنی توانا و دەستەڵاتە.. لەناوچوون و کاول بوونی دنیاش شتێکی مومکینە.. ئەو کاول بوونەش لە ڕاستیدا ڕوو دەدات.. پاشان زیندووکردنەوە و کۆکردنەوەی ئەم جیهانە سەرلەنوێ، ئەویش مومکینە.. ئەو زیندووکردنەوە و کۆکردنەوەیەش بە ڕاستی، ڕوو دەدات.

وا بە کورتی و یەك لە دوای یەك، باسی ئەم شەش مەسەلەیە بە جۆرێك دەکەین کە "ژیریی مرۆڤ" دڵنیا بکات. ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە لە "پەیامی حەشر"دا چەند بەڵگەیەکی ئەوتۆمان بۆ ئەم مەسەلانە هێناوەتەوە کە قەناعەتیان بە "دڵان" بەخشی و گەیاندنیە پلەی ئیمانی تەواو. بەڵام ئەوەی لێرەدا باسی دەکەین بە شێوەیەکی ئەوتۆیە کە "ژیری" ئیقناع و بێدەنگ بکات. هەروەك "سەعیدی کۆن" لە پەیامی "نقطـة"دا هەمان ڕێبازی لە باسکردنی ئەو بابەتانەدا گرتەبەر.

بەڵێ، چەند داخوازێکی وا هەن کە ژیانی ئەودنیا بکەن بە شتێکی پێویست، ئەو هۆیەش هەیە بۆ ئەوەی کە بەختەوەریی هەمیشەیی بەرپا ببێت و بێتە کایەوە، ئەو بەڵگە بەهێز و پتەوەش کە ئەم پێویستییە ڕوون دەکاتەوە، دڵنیاییەکە لە "دە" خولگە و سەرچاوەوە هەڵقوڵاوە:

❑ **خولگەی یەکەم:**

ئەگەر سەرنج لە هەموو لایەکی گەردوون بدەین، بۆمان دەردەکەوێت کە لە هەموو بەش و سووچێکەوە ڕێسا و یاسا و ڕێکوپێکییەکی ئامانجدار هەیە.. دەبینین لە هەموو

لایەکیەوە ویست و ئیرادە و مەبەست دەردەکەوێت، بە رادەیەك کە رووناکیی "مەبەست" لە هەموو شتێکدا و، درەوشانەوەی "ویست" لە هەموو کارێکدا و، بریسکانەوەی "هەڵبژاردن" لە هەموو جموجوولێکدا و، رۆشنایی "دانست" لـە هـەموو پێکـهاتنێکدا، بـەرچاو دەکەون و دەدرەوشێنەوە.

بەروبوومی ئەمانەی باس کران لە راستیدا تابلێی سەرنج راکێشە!

جا ئەگەر ژیانێکی تر و بەختەوەرییەکی هەمیشەیی نەبێت، ئەوا ئەم هەموو رێکوپێکییە ناوازەیە بە چی لێك دەدرێتەوە؟ دیارە ئەو کاتە تەنها بە وێنە و سێبەرێکی لاواز و بێکەڵك لە قەڵەم دەدرێت و، رێسا و یاسایەکی بێ بناغە و درۆینە دەردەچێ. ئیتر هەرچی پەیوەندی و نیسبەت و مەعنەوییات هەن - کە گیانی ئەو رێسا و رێکوپێکییەن - لە ناو دەچن.

واتە تەنها ژیانی دوارۆژ و بەختیاریی هەمیشەیی وایان لەم رێسایەی ناو گەردوون کردووە کە لە راستیدا رێسا بێت و واتایەکی ببێت. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەم رێسا و رێکوپێکییەی دنیا ئاماژە بۆ ژیان و بەختیاریی هەمیشەیی ئەو دنیا دەکات.

**❑ خولگەی دووهەم:**

لە بەدیهێنانی بوونەوەراندا حیکمەتێکی زۆر ئاشکرا دەردەکەوێت..

بەڵێ، ئەو حیکمەتە خواییەی کە ئاماژە بۆ چاودێریکردنی هەمیشەیی خوا بۆ بەدیهێنراوانی دەکات، زۆر روون و ئاشکرایە. چونکە چاودێریکردنی بەرژەوەندی و دانانی حیکمەت لە هەموو بوونەوەرێکدا، شتێکی روون و ئاشکرایە لای هەموان. ئەمەش بە زمانی حاڵی خۆی دەری دەبرێت کە ژیانی ئەودنیا و بەختەوەریی هەمیشەیی هەیە و پەیدا دەبێت. چونکە ئەگەر ژیانێکی تر نەبێت، دەبێ سەرپێچی بکەین و دان بەو هەموو سوود و حیکمەتانەدا نەنێین کە لەو بوونەوەرانەدا هەن.

لێرەدا هەر ئەمەندە لەم بارەیەوە دەدوێین و، ئەو کەسەی دەیەوێت بە تەواوی لەم بارەیەوە ئاگادار بێت، با سەیری راستیی دەهەمی "وتەی دەهەم"(پەیامی حەشر) بکات. چونکە ئەم راستییە لەوێ وەك خۆر دەدرەوشێتەوە.

**❑ خولگەی سێهەم:**

بە ژیری و دانایی و پشکنین و تاقیکردنەوە چەسپاوە کە لە دروستکردنی بوونەوەراندا هیچ ئیسراف و زیادەڕەوییەك نییە. ئەم نەبوونەش ئاماژە بۆ بەختەوەریی هەمیشەیی و رۆژی دوایی دەکات..

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە هیچ ئیسراف و زیادەڕەوییەك لە سروشت و بەدیهێنانی هیچ شتێکدا نییە، ئەوەیە کە خواوەندی بەدیهێنەر بۆ دروستکردن و بەدیهێنانی هەرشتێك

نزيكترين ڕووو ڕێگاو، نه‌رمترين شێوه‌و، جوانترين چۆنێتيى هه‌ڵبژاردووه‌. ئه‌وه‌تا ده‌بينين تاقه‌ يه‌ك شت سه‌د ئه‌ركى پێ ده‌سپێررێت، يان بچووكترين شت هه‌زاران ئه‌نجام و ئاكامى پێوه‌ ده‌به‌سترێت. ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌ ده‌گه‌يه‌نێت كه‌ هيچ ئيسراف و زياده‌ڕه‌وى و گاڵته‌يه‌ك نه‌بووه‌ و نابێت. كه‌ ئه‌مانه‌ش نه‌بوون، ماناى وايه‌ ژيانى هه‌ميشه‌يى ئه‌ودنيا په‌يدا ده‌بێت و دێته‌ كايه‌وه‌. چونكه‌ ئه‌گه‌ر سه‌رله‌نوێ ژيان په‌يدا نه‌بێته‌وه‌، ئه‌وا ئه‌و نه‌مان و نه‌بوونه‌ى كه‌ به‌ گوێره‌ى ڕواڵه‌ت و سه‌يركردنى ساكارانه‌، به‌ "نه‌مان" و "نه‌بوون" ده‌رده‌كه‌وێت سه‌باره‌ت به‌و مردنه‌ى كه‌ ده‌كه‌وێته‌ كۆتايى ژيانى دنيا، هه‌رچى شت هه‌يه‌ ده‌كاته‌ گاڵته‌ و زياده‌ڕه‌وى. واته‌ واى لێ دێت كه‌ هه‌رچى له‌وه‌وپێش بووه‌، هه‌موو ئيسراف و زياده‌ڕه‌وى بووبن!

به‌ڵام ئێمه‌ به‌ چاوى خۆمان ده‌بينين و، به‌پێى زانستى "كارمه‌نديى ئه‌ندامه‌كان"(علم وظائف الأعضاء) ده‌زانين و بێ‌گومانين له‌وه‌ى كه‌ هيچ كام له‌ به‌ديهێنراوان – به‌ تايبه‌تى مرۆڤ – هيچ ئيسرافێكيان تێدا نىيه‌. ئه‌مه‌ش بۆمان ده‌رده‌خات كه‌ هه‌رگيز ناگونجێ ئه‌و هه‌موو توانا و لێهاتن و حه‌ز و بير و هۆش و ئاواتانه‌ى مرۆڤ – به‌ نه‌بوونى ژيانێكى تر – به‌ خۆڕايى بڕۆن و ببن به‌ ئيسراف و زياده‌ڕه‌وى..

چونكه‌ ئه‌و تاسه‌ و ئاره‌زووه‌ ڕه‌سه‌ن و به‌تين و دامه‌زراوه‌ى كه‌ له‌ قووڵايى ناخى مرۆڤدا جێگير بووه‌ بۆ گه‌يشتن به‌ كه‌ماڵات، پێمان ده‌سه‌لمێنێت كه‌ ده‌بێ جۆره‌ كه‌ماڵاتێكى تايبه‌تى ببێت. هه‌روه‌ها ئه‌و چاوه‌ڕوانى و ئاره‌زووه‌ش كه‌ له‌ مرۆڤدايه‌ بۆ به‌ختيارى، پڕ به‌ ده‌م هاوار ده‌كات كه‌ به‌خته‌وه‌رى‌يه‌كى هه‌ميشه‌يى هه‌يه‌ و، هه‌ر ئه‌م مرۆڤه‌شه‌ كه‌ بۆ ئه‌و به‌خته‌وه‌رى‌يه‌ ده‌ستنيشان كراوه‌.

ئه‌گه‌ر وا نه‌بێت، ده‌بێ ئه‌و مه‌عنه‌وياته‌ به‌تين و ئاواته‌ به‌رزانه‌ى كه‌ ماهييه‌تى ڕاسته‌قينه‌ى مرۆڤيان له‌سه‌ر بنيات نراوه‌، هه‌موويان به‌ گشتى – كه‌ ئه‌مه‌ش كارێكه‌ له‌ خواى گه‌وره‌وه‌ دووره‌ – ببنه‌ ئيسراف و گاڵته‌ و زياده‌ڕه‌وى و، به‌ خۆڕايى له‌ده‌ست بچن. به‌ پێچه‌وانه‌ى ئه‌و دانسته‌ى كه‌ له‌ گشت به‌ديهێنراواندا هه‌يه‌!

لێره‌دا به‌مه‌نده‌ واز ده‌هێنين، چونكه‌ زووتر له‌ ڕاستيى يازده‌هه‌مى "وته‌ى ده‌هه‌م"دا چه‌سپاندوومانه‌.

**❑ خولگه‌ى چواره‌م:**

ئه‌و گۆڕانكارى‌يانه‌ى كه‌ له‌ زۆربه‌ى جۆره‌كاندا ڕوو ده‌ده‌ن، ته‌نانه‌ت له‌ شه‌و و ڕۆژ و زستان و به‌هار و هه‌وادا و، ته‌نانه‌ت له‌ له‌شى مرۆڤيشدا به‌ درێژايى ته‌مه‌نى.. هه‌روه‌ها ئه‌و نوستنه‌ش كه‌ براى مردنه‌.. هه‌ريه‌ك له‌مانه‌، وه‌ك زيندووبوونه‌وه‌ و حه‌شرێك وايه‌ و جۆره‌

قیامەتێکە بۆ هەرکام لەو جۆرانە و، بە "هێما" هەواڵی پەیدابوونی قیامەتی گەورە مان پێ ڕادەگەیەنێت!

هەروەك کاتژمێرەکانمان ڕۆژ و سەعات و خولەك و چرکە دەژمێرن و، بە جووڵانی هەرکام لەمانە جووڵانەوەی ئەوی تر دەزانرێت و، سەرەتای جووڵانەوەی ئەوەی دوای خۆیەتی، هەر بەو جۆرە، ئەم جیهانەش کە وەك سەعاتێکی خوایی وایە و، بە هاتوچۆ و لەدوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکانی، ئەوانی تر دەزانرێن و، شەو و ڕۆژ و ساڵان دەژمێرێت و هەریەك لەمانیش دەبن بە پێشەکی بۆ ئەوانەی دوای خۆیان، ئەم هاتوچۆیەی کە پێی دەزانین ڕۆژ بەدوای شەودا و، بەهار بە دوای زستاندا دێت، هێمایەکە ئاماژە بۆ هاتنی بەرەبەیانی قیامەت لە دوای شەوگاری مردن دەکات و دەیچەسپێنێت کە ئەم کارە لە دەست ئەو توانستە ڕەها و سەعاتە گەورە خواییەدا، کارێکی زۆر ئاسانە.

مرۆڤ هەر لە درێژایی تەمەنی خۆیدا، چەندین قیامەتی جۆراوجۆری بەسەردا دێت، لە هەموو شەوێکدا جۆرە مردنێك و لە هەموو بەیانی‌یەکدا جۆرە زیندووبوونەوەیەك بە خۆیەوە دەبینێت. واتە: مرۆڤ بە چاوی خۆی بەڵگەکانی حەشر دەبینێت. تەنانەت دەبینێت کە چۆن لە ماوەی ساڵێکدا هەموو خانە و گەردیلەکانی جەستەی دەگۆڕێن، بەڵکو لە ماوەی ساڵێکدا دوو جار نموونەی لەسەرخۆ(تەدریجی)ی حەشر لەو ئاڵوگۆڕانەدا دەبینێت کە بەسەر لەشیدا تێپەڕ دەبن.. هەروەها جۆرێکی تری حەشر و قیامەت لە هەموو بەهارێکدا و لە زیندووبوونەوەی پتر لە سێ‌سەد هەزار جۆر لە ئاژەڵ و ڕووەکدا، دەبینێت.

ئەم هەموو بەڵگە و نیشانە و ئاماژە لەژمارەبەدەرانەی بوونی قیامەت، بێ گومان هەموویان ئەو ڕۆژەمان بۆ دەچەسپێنن.

جا ڕوودانی ئەم ئاڵوگۆڕانەی کە لە زیندووبوونەوە دەچن و لە جۆرەکاندا ڕوو دەدەن و لە لایەن خواوەندی داناوە ئەنجام دەدرێن، وەك ڕوودانی ئەو جۆرە قیامەتەی بەهاران لە لایەن خواوەندەوە، کە هەندێ ڕەگی ڕووەکەکان و، خودی ئاژەڵ و زیندەوەران و، گوڵ و گەڵا و بەروبوومەکانیش بە هاووێنە و هاوچەشنی خۆیان، زیندوو دەکاتەوە..

هەموو ئەمانە، دەبن بە بەڵگە لەسەر زیندووبوونەوەی هەموو "تاکێك"ی مرۆڤ لە نێوان قیامەت و زیندووبوونەوەی گشتیدا. بەهۆی ئەوەی "تاك" لە مرۆڤدا، لە بەرامبەر "جۆر"دایە لە شتانی تردا. چونکە ڕووناکیی بیر و هۆش، فراوانی‌یەکی ئەوتۆی لە ئاوات و بیرکردنەوەی مرۆڤدا دروست کردووە کە بتوانێت ڕابوردوو و داهاتوو بخاتە ژێر باڵی خۆیەوە، بەڵکو ئەگەر هەموو دنیاشی ببێت، هێشتا هەر قایل نابێت و تێری پێ ناخوات. بەڵام

لـه جۆره‌كـانی تـردا، چییـه‌تی(ماهیـــة) هـه‌ر تـاكێكی "جوزئـی"یـه‌و، نرخـی خـۆی ته‌نـها بـه‌ خۆیه‌وه‌یه‌و، بیر و هۆشی تا ئه‌ندازه‌یه‌كه‌و، ئاوات و ئاره‌زووه‌كانیشی كاتین. كه‌چی ده‌بینـین چییـه‌تی و تایبه‌تكاری‌یـه‌كانی مرۆڤ تـابلێی بـه‌رزن و، نرخیـان گرنگـه‌و، نیگـای ڕوانینـی گشـتی و فراوانـه‌و، كـه‌مالاتی لـه‌ سـنوور بـه‌ده‌ره‌و، هـه‌ندێكیش لـه‌ ئـازار و ئـاره‌زووه‌ مه‌عنه‌وی‌یه‌كانی هه‌میشه‌یین..

له‌به‌ر ئه‌مه‌، هه‌ر شتێك له‌ دووپات بوونـه‌وه‌ی هاوچه‌شنه‌كانی قیامـه‌ت لـه‌ "جـۆر"ه‌كـانی تـردا ده‌بینـین، هێمایـه‌ بـۆ زیندووبوونـه‌وه‌ی هـه‌موو كـه‌س و "تـاك"ێكـی مـرۆڤ لـه‌ قیامـه‌تی گه‌وره‌دا!

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌مه‌مان له‌ ڕاستیی نۆهه‌می "وتـه‌ی ده‌هـه‌م"دا وه‌ك گومـان نـه‌كردن لـه‌ "دوو كـه‌ڕه‌ت دوو ده‌كاتـه‌ چـوار" چه‌سپاندووه‌ و ڕوونمـان كردووه‌تـه‌وه‌، ئـه‌وا لـێره‌دا بـه‌ كورتـی باسمان كرد.

☐ **خولـگه‌ی پێنجه‌م:**

زانا لێكۆڵه‌ره‌كان ڕایان وایه‌ كه‌:

بیروبۆچوونه‌ له‌ژماره‌به‌ده‌ره‌كانی مرۆڤ.. كه‌ له‌ هیوا و ئاواته‌كانیـه‌وه‌ په‌یدا بـوون.. كـه‌ ئه‌وانیش به‌رهـه‌می ئـه‌و حـه‌ز و ئـاره‌زووه‌ زۆرانه‌یـه‌تی كـه‌ لـه‌ توانـا و لێـهاتنی فـراوان و بـێ سنووریه‌وه‌ سـه‌ری هـه‌ڵداوه‌.. كـه‌ ئه‌مانـه‌ش لـه‌ نـاوه‌رۆك و حه‌قیقـه‌تی ڕۆحـی‌دا چه‌سپاون.. هه‌ریه‌ك له‌مانه‌، به‌ چاو ده‌ڕوانێت و، به‌ ده‌ستیش ئاماژه‌ بۆ ئه‌و جیهانی به‌خته‌وه‌ری‌یـه‌ ده‌كـات كه‌ له‌ دوای ئه‌م جیهانه‌ی خۆمانه‌وه‌ په‌یدا ده‌بێت..

چونكه‌ ئه‌و فیتره‌ت(سـروشـت)ه‌ی مرۆڤ كه‌ هـه‌رگیز درۆ نـاكات و، زۆر بـه‌ تـوندیش حـه‌ز و ئـاره‌زووی لـه‌ ژیـانی پڕ به‌ختـه‌وه‌ریی ئه‌ودنیایه‌، دڵنیـایی بـه‌ دڵ و ده‌روونـی مـرۆڤ ده‌دات كه‌ ئه‌و به‌خته‌وه‌ری‌یه‌ هه‌میشه‌یی‌یه‌ی ئه‌ودنیا دێته‌ كایه‌وه‌.

لـێره‌دا بـه‌م ئه‌ندازه‌یـه‌ واز ده‌هێنـین، چونكـه‌ ڕاسـتیی یازده‌هـه‌می "وتـه‌ی ده‌هـه‌م" ئـه‌م ڕاستی‌یه‌ی وه‌كو ڕۆژی دره‌خشان ڕوون كردووه‌ته‌وه‌.

☐ **خولـگه‌ی شه‌شه‌م:**

بـه‌زه‌یی و میـهره‌بانیی به‌دیهێنـه‌ری بوونـــه‌وه‌ر - كـه‌ خواوه‌نـدی به‌خشـنده‌ و دلۆڤانـه‌ - باشترین به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشه‌یی ئه‌ودنیا.

به‌ڵێ، ته‌نـها هـه‌ر ئـه‌و به‌خته‌وه‌ری‌یـه‌ هه‌میشـه‌یی‌یه‌یه‌ كـه‌ نیعمـه‌تی كـردووه‌ بـه‌ نیعمـه‌ت و، پاراستوویه‌تی له‌وه‌ی كه‌ ببێت به‌ به‌ڵا و گیروگرفت.. هه‌ر ئـه‌وه‌ كه‌ بوونـه‌وه‌رانی لـه‌ گریـه‌ و

زاریی لێکدابڕان و جودایی هەمیشەیی دەرباز کردووە. ئەمەش کارێکە تەنها بەو میهرەبانی‌یە بێ‌سنوورە دەکرێت کە ئەوەندە فراوانە هیچ کەسێکی لێ بێ‌بەش نابێت.

چونکە ئەگەر نیعمەتی بەختەوەریی هەمیشەیی ئەودنیا - کە لە سەرووی هەموو نیعمەتێکەوەیە و ئاکامی هەموویانە - بە مرۆڤ نەبەخشرێت، واتە ئەگەر دنیا لە شێوەی ئاخیرەتدا زیندوو نەکرێتەوە، ئەوا هەموو ئەو نیعمەتانە دەبن بە بەڵا و گیروگرفت. دیارە ڕوودانی شتی وەهاش وا لە مرۆڤ دەکات کە دان بەو میهرەبانی‌یە فراوان و زۆرەی خواوەنددا نەنێت، کە لەوپەڕی ئاشکرایی و ڕوونیدایە و، هەموو بوونەوەرێك شایەتیی لەسەر دەدات و، ڕاستی‌یەکی وەك خۆری ناوجەرگەی ئاسمان درەخشان و پرشنگدارە.

جا ئەگەر ئێمە وا دابنێین کە ژیانی مرۆڤایەتی بەرەو چارەنووسێکی ڕەشی وەك جودایی و لەناوچوونی هەمیشەیی بڕوات، لە لایەکی تریشەوە سەرنجێکی وردی ئەو شوێنەوارە وردانەی میهرەبانیی فراوان و نەبڕاوەی خوای گەورە بدەین لە نیعمەتەکانی: "خۆشەویستی و سۆز و ژیری"دا، ئەوا دەبینین ئەو "خۆشەویستی"یە دەبێت بە گیروگرفتێکی گەورە و، ئەو "سۆزە"ش دەبێتە دەردێکی گران و، "ژیری"ش دەبێت بە بەڵایەکی گەورە بەسەر مرۆڤەوە. کەچی میهرەبانی و بەزەیی، لەبەر ئەوەی ناوەرۆکی بەزەیی و میهرەبانی‌یان گرتووەتە خۆ، هەرگیز لە بەرامبەر ئەو خۆشەویستی‌یە ڕاستەقینەوە پاداشتی جودایی هەمیشەیی و نەبوون و فەوتان نادەنەوە! واتە دەبێ ژیانێکی نوێ بۆ مرۆڤ دروست ببێتەوە.

بۆیە لێرەدا ئەم ڕاستی‌یەمان بە کورتی باس کرد، چونکە لە ڕاستیی دووهەمی "وتەی دەهەم"دا زۆر بە باشی ڕوونمان کردووەتەوە.

❑ **خولگەی حەوتەم:**

هەموو ئەو جوانی و کەماڵات و تاسەمەندی و وردەکاری و بەزەیی‌یانەی کە لەم بوونەوەرانەدا دەیانبینین، بریتین لە چەند واتا و ناوەرۆك و، چەند وتەیەکی مەعنەوی، کە زۆر بە ڕوونی دەریدەبڕن بۆ "دڵ" و "ژیری" کە هەرکام لەوانە درەوشانەوەی چاکە و بەخشندەیی خوای بەدیهێنەر و گەورەن و، لە بەزەیی و لوتفی هەمیشەیی ئەو خوایەوە پەیدا بوون.

جا مادەم لەم جیهانەی ئێمەدا ڕاستیی گومان لێ‌نەکراو هەیە و، ئەو بەزەیی‌یەش ڕاستی‌یەکی بێ گومانە، ئەوا ئەو بەزەیی‌یە دەمانگەیەنێتە بەختەوەریی هەمیشەیی.

ڕاستیی دووهەم و چوارەم لە "وتەی دەهەم"دا ئەم ڕاستی‌یەیان وەك خۆر ئاشکرا کردووە و ڕوونیان کردووەتەوە.

❐ **خولگەی هەشتەم:**

ویجدانی هەستیاری مرۆڤ، کە بریتی‌یە لە سروشتەکەی، بەڵگەیەکە لەسەر ژیانی ئەودنیا و، چاوی لەو بەختەوەری‌یە هەمیشەیی‌یەی ئەوێیە.

بەڵێ، هەرکەس بە وردی گوێ بۆ "ویجدان"ی بەئاگا و بێداری خۆی ڕابگرێت، بە دڵنیایی زایەڵەی دەنگی: (ئەبەد.. ئەبەد)ی لێ دەبیستێ! بە ڕادەیەك کە ئەگەر هەرچی لە بوونەوەردا هەیە، بەو ویجدانە بدرێت، هێشتا هەر پێویستیی بەو ئەبەدییەتە نابڕێتەوە و ئەو دەنگە کپ نابێت! واتە ئەم ویجدانە بۆ "ئەبەد" دروست کراوە و، ئەم بکێش و ڕاکێشانەش کە لە نێوان مرۆڤ و ئەبەددا هەیە تەنها بە بکێشێکی حەقیقی و لە مەبەستێکی ڕاستەقینەوەیە.

کۆتایی ڕاستیی یازدەهەم لە "وتەی دەهەم"دا ئەم ڕاستی‌یەی بە جوانی ڕوون کردووەتەوە.

❐ **خولگەی نۆهەم:**

فەرموودەکانی پێغەمبەری ڕاستگۆمان حەزرەتی محەممەدی هاشمی ﷺ کە هەر هەموویان ڕاست و دروست و تەسدیق کراون، دەرگاکانی بەختەوەریی ئەودنیایان خستووەتە سەر پشت و، کلاوڕۆژنەیەکن بەسەر ئەو بەختەوەری‌یەی دواڕۆژدا دەڕوانن.

بەڵێ، فەرموودەکانی ئەم پێغەمبەرەی کە لە هێزی یەکدەنگی(إجماع)ی هەموو پێغەمبەران و تەواتوری هەموو ئەولیا ڕاستگۆکاندایە، پاش ئەو گرنگی‌یەی کە بە "بوون" و "یەکتایی"ی خوای گەورەی داوە، ئەوپەڕی بایەخی بەم مەسەلە بنەڕەتی‌یە داوە، کە مەسەلەی زیندووبوونەوە و ژیانی ئەودنیایە.

ئایا ئیتر هیچ هێزێك هەیە بتوانێت لەرزە بەم هێزە پتەوە توندوتۆڵە بخات و لە جێگای خۆی‌دا بیجووڵێنێت؟

ڕاستیی دوازدەهەمی "وتەی دەهەم" ئەم ڕاستی‌یەی بە جوانی ڕوون کردووەتەوە.

❐ **خولگەی دەهەم:**

مەبەست لەم خولگەیە: هەواڵدانی ئەو قورئانە پیرۆزەیە، کە بە درێژایی سیازدە سەدەی ڕەبەق، بە حەوت شێوە ئیعجازی خۆی پیشان داوە و هێشتوویەتیەوە. وەك لە "وتەی بیست و پێنجەم"دا چل جۆرمان لە ئیعجازەکەی باس کردووە.

بەڵێ، هەرتەنها هەواڵدانی ئەم قورئانە پیرۆزە سەبارەت بە زیندووبوونەوە، سەروزیادە و ڕوونکردنەوەیەکی گەلێ ئاشکرایە، چونکە قورئانی پیرۆز کلیلی حیکمەت و نهێنیی داخراوی جیهان و هەموو بوونەوەرانە.

سەرەڕای ئەوەش، قورئان خۆی لە چەندین جێگادا داوای تێفکرین دەکات و سەرنجی مرۆڤ بۆ هەزاران بەڵگەی گومان لێنەکراو ڕادەکێشێت..

بۆ نموونە، ئەم دوو ئایەتەی کە دەفەرموون:

﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَاراً﴾ (نوح:١٤) و..

﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (يس:٧٩).

دوو نموونەن بۆ بەکارهێنانی "قیاسی تەمسیلی". هەروەها ئایەتی:

﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾یش (فصلت:٤٦) نموونەیەکی ترە لە قورئاندا و ئاماژە بۆ بەڵگەی دادگەری(عەدالەت) دەکات، کە لە بوونەوەردا هەیە.

هەروەها چەندین ئایەتی تر لە قورئانی پیرۆزدا هەن کە چەندین ڕوانینگا(مراصد) و دووربینی گەورەکەرەوەی زۆریان تێدا دانراوە، مرۆڤ دەتوانێت بە هۆیانەوە تەماشای زیندووبوونەوە و بەختەوەریی ئەودنیا بکات.

لە پەیامی "خالێك لە نووری ناسینی خوای گەورە"دا، ئەو قیاسی تەمسیلییەمان – کە لە دوو ئایەتی پێشوو و چەند ئایەتێکی تردا هەیە – ڕوون کردووەتەوە. پوختەکەی بەم شێوەیە:

کاتێ کە مرۆڤ لە پلەیەکەوە دەچێتە پلەیەکی تر، بە چەند ئاڵوگۆڕێکی ڕێکوپێك و سەیردا تێپەڕ دەبێت. دەبینیت لە پێشدا "ئاو"ە، پاشان دەبێت بە "زەروو" ئنجا دەبێت بە "پارچەیەك گۆشت"، پاش ئەوەش دەبێت بە "ئێسك" پاشان ئەم ئێسکە بە گۆشت دادەپۆشرێت، ئنجا دەبێت بە بەدیهێنراوێکی نوێی سەربەخۆ و جیاواز لە هەموو ئەوانی تر. واتە هەتا دەبێت بە مرۆڤ، بە چەند یاسا و ڕێبازێکی ورددا تێپەڕ دەبێت. چونکە هەرکام لەو پلە و هەنگاوانەی کە مرۆڤ لە دەمی دروستبوونیدا پیایدا تێپەڕ دەبێت، ئەوەندە هەڵسوکەوتی سەربەخۆ و یاسا و ڕێبازی تایبەتی و ورد و دیاریکراویان هەیە، کە زۆر بە جوانی ڕووناکیی: "ویست و، حیکمەت و، ئیختیار"یان تێدا دەردەکەوێت.

هەر بەهەمان ڕێگا، خوای گەورەی بەدەستەڵات ساڵانە، بە چەشنی گۆڕینی بەرگ و پۆشاك، جەستەی مرۆڤ دەگۆڕێت. چونکە لەشی مرۆڤ پێویستی بە پێکهاتنێکی نوێ هەیە، بۆ ئەوەی خۆی بگۆڕێت و هەر بە زیندوویی بمێنێتەوە و چەند گەردیلەیەکی کارگوزاری نوێ بڕۆنە جێی "خانە" لەکارکەوتووەکان.

جا هەروەك خانەکانی لەشی مرۆڤ بە یاسایەکی ڕێکوپێکی خوایی دەڕووخێن، هەروەها بە یاسایەکی وردی خواییش پێویستیان بەوە هەیە کە سەرلەنوێ تازە بکرێنەوە و بنیات بنرێنەوە. لەبەر ئەوە، خوای گەورەی ڕۆزیدەر(الرزاق) بە یاسایەکی تایبەتی و بە

ڕێژەیەكی دیاری كراو، ڕۆزیی هەموو ئەندامەكانی لەش بە گوێرەی پێویستی دەبەخشێت و هیچیان بێبەش ناكات.

ئێستا بۆ ئەو مادده ورد و ناسكە بڕوانە كە لە لایەن خواوەندی ڕۆزیدەری داناوە بۆ ئەو لەشە نێرراوە. دەبینیت گەردیلەكانی ئەو ماددەیە، وەك كاروانێك وان كە بەناو بەرگی هەوایی(غلاف جوی) و، زەوی و، ئاو و، هەوادا پەرش و بڵاون. بەڵام هەر كە لە شێوەی نەفیر عامێكدا داوایان لێ دەكرێت كۆ ببنەوە، یەكسەر و بە چۆنێتییەكی تایبەتی، كۆ دەبنەوە. وەك ئەوەی هەریەكەیان كارمەندێكی ڕەسمی بێت و، بۆ كاروبارێكی تایبەتی نێررابێت و لەگەڵ یەكتردا كۆ بوو بێتنەوە. بە جۆرێك كە ئەوە بگەیەنێت: بزووتنەوەی ئەمانە بزووتنەوەیەكی مەبەستدارە و بە بێ ویست و ئیرادە ڕووی نەداوە. ئەمەش ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە: یەكێكی "خاوەن ویست" هەیە بە یاسایەكی تایبەتیی خۆی پاڵ بەو گەردیلانەوە دەنێت و، لە جیهانی نائۆرگانییەوە بەرەو جیهانی زیندوویی و ئۆرگانی دەیانبات.

ئیتر ئەو گەردیلەیە كە بە شێوەی ڕۆزی ڕۆشتە هەر لەشێكەوە، بە گوێرەی چەند یاسا و دەستوور و، چەند بزووتنەوە و جموجوولێكی تایبەتی، دەكەوێتە كار. چونكە دوای ئەوەی كە لە چوار جێگادا دەكولێنرێت و، بە چوار ئالوگۆڕی تایبەتیدا دەڕوات و، لە چوار پالێوگەدا تێپەڕ دەبێت و دەپالێورێت، ئنجا بەسەر ئەندامەكانی لەشدا و بە گوێرەی پێویستیی هەركام لەو ئەندامانە، دابەش دەكرێت. هەموو یەكێك لەمانەش، لە ژێر چاودێریی ڕۆزیدەری ڕاستەقینەدا و، بەپێی یاسا ڕێكوپێكەكانی ئەو ڕوو دەدات.

جا ئەگەر بێت و بە چاوی حیكمەتبینییەوە سەرنج بدەیت، دەبینیت هەركام لەو گەردیلانە یەكێك بەڕێوەیان دەبات كە لەوپەڕی ڕێكوپێكی و لێزانینداییە و، هەرچییەك پەیوەندیی بەم گەردیلانەوە بێت، ئەو بەوپەڕی ئاگاداریییەوە دەیبیستێت و گوێی لێیەتی، بە ڕادەیەكی ئەوتۆ كە نە "ڕێكەوتی كتوكوێر" و نە "سروشتی كەڕ و لاڵ" و نە "هۆكارە بێ هەست و شعوورەكان"، هیچیان ناتوانن دەست بخەنە ناو كارەكانییەوە..

چونكە هەموو یەكێ لەو گەردیلانە لە هەر پلەیەكیدا، لەو كاتەوە كە لە دەرەوەدا توخمێكی پەرش و بڵاو بووە، تا ئەو كاتەی ڕۆشتووەتە ناو خانەكان، وەك خاوەن هەست و ویستێك جووڵاوەتەوە و، بەپێی ئەو یاسایانەی كە لەو پلە و هەنگاوانەدا هەن، هەڵسوكەوتی نواندووە، چونكە بە جوانی دەری دەخات كە: ئەم گەردیلەیە بە فەرمانی یەكێكی دانا بەڕێوە

دەڕوات و دەجوولێتەوە. ئیتر بەم چەشنە و بەوپەڕی ڕێکوپێکی و بە فەرمانی خوای گەورە ئەم گەردیلەیە پلە لە دوای پلە دەبڕێت و، لە ئامانجەکانی خۆی لانادات تا دەگاتە جێگای تایبەتیی خۆی، بۆ نموونە: لە گلێنەی چاوی "تۆفیق"دا[1] ئیتر لەوێ ڕادەوەستێت بۆ ئەوەی ئەو کار و ئەرکانەی پێی سپێرراوە، ئەنجامیان بدات!

بەم جۆرە، دەرکەوتنی پەروەردگارێتیی خوا لە ڕۆزییەکاندا ڕوونی دەکاتەوە کە هەریەك لەو گەردیلانە هەر لە سەرەتاوە دەستنیشان کراوە و کاری خۆی پێ سپێرراوە و بەرپرس بووە لێی و، ئامادەی ئەوە بووە کە بڕواتە ناو ئەو جێگایەی بۆی دیاری کراوە. وەك بڵێی هەریەکەیان چارەنووسی خۆی لەسەر نووسرا بێت کە دەبێ ببێت بە ڕۆزیی فڵانە خانە لە فڵانە جێگادا! دیارە ئەم ڕێکوپێکییە جوانەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەرچی مرۆڤ هەیە ناوی لەسەر ڕۆزییەکەی خۆی نووسراوە، هەروەك ناوی ڕۆزییەکەی لەسەر ناوچاوانی ئەو بە قەڵەمی قودرەتی خوا نووسراوە و دیاری کراوە!

ئایا ئیتر دەگونجێ ئەو پەروەردگارەی کە خاوەنی توانست و دانستێکی ئاوا ڕەها و فراوانە، ژیانی ئەودنیا نەهێنێتەکایەوە و زیندوومان نەکاتەوە؟ یاخود لە توانایدا نەبێت؟ لەکاتێکدا ئەو پەروەردگارە خوایەکی وایە کە هەرچی موڵکی زەوی و ئاسمانەکان هەن، هەموویان لە ژێر دەستەڵاتی ئەودان و، هەر لە "گەردیلەکان"ەوە تا دەگاتە "گەلەستێرەکان" بە یاسایەکی لەوپەڕی ڕێکوپێکی و وردەکاریدا بەڕێوە دەبات؟.. نەخێر، شتی وا هەرگیز ناگونجێ و مومکین نییە.

لەبەر ئەوە دەبینین قورئانی پیرۆز، لە زۆربەی ئایەتەکانیدا، سەرنجی مرۆڤ بۆ دروستبوونی یەکەم جار ڕادەکێشێت و دەیکات بە نموونەیەك لەسەر گونجانی ژیانی ئەودنیا و، وەك "تەرازوویەك" دەیخاتە پێشچاوی مرۆڤ تاکو گونجانی زیندووبوونەوەی ئەودنیای پێ لێك بداتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی لە زەینی مرۆڤدا نەسەلماندنی زیندووبوونەوە دوور بخاتەوە. دەبینین قورئان دەفەرموێ:

﴿قُلْ يُحيِيهَا الَّذي أَنشَأها أَوَّل مَرَّةٍ﴾! (يس:٧٩).

واتە: ئەو خوایەی کە لە سەرەتاوە و لە نەبوونەوە ئێوەی دروست کردووە، هەر ئەو خوایە لەودنیاشدا زیندووتان دەکاتەوە.

یان دەفەرموێ:

﴿وَهُوَ الذي يَبْدأُ الخَلقَ ثُمّ يُعيدُهُ وَهُوَ أَهوَنُ عَليهِ﴾ (الروم:٢٧).

---

(١) تۆفیق: یەکێکە لە قوتابییەکانی مامۆستا نوورسی. (وەرگێڕ)

واتە: دروستكردنەوە و زیندووكردنەوەتان لەودنیادا، لە دروستكردنی ئەم دنیا ئاسانترە.

چونكە هەروەك لەو كاتەدا كە سەربازەكان بۆ پشوودان بڵاو بوونەتەوە، دەتوانرێت تەنها بە لێدانی شەیپووری سەربازی هەموویان لە ژێر ئاڵای تیپەكەیاندا كۆبكرێنەوە و، ئەم كارە لە دروستكردنی هێزێكی سەربازیی نوێ ئاسانترە.. هەر بەو جۆرەش، زیندووكردنەوە و پێكهێنانەوە و كۆكردنەوەی گەردیلە بناغەییەكانی لەشی هەر مرۆڤێك، كە چەند كاتێك پێكەوە بوون و پەیوەندییان لەگەڵ یەكتریدا بووە، لەو كاتەدا كە "ئیسرافیل" فوو بە شەیپوورەكەیدا دەكات، بێ گومان بە لای عەقڵەوە لە دروستكردنی یەكەمجاری گەلێ ئاسانترە.

لەوانەشە پێویست بە كۆكردنەوەی هەموو گەردیلەكان نەكات، بەڵكو هەر تەنها گەردیلە سەرەكییەكان، ئەوانەی كە وەك تۆو و ناوك وان لە ڕووەكەكاندا - كە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بە "عَجْبُ الذَّنَبِ"[1] ناویان دەبات - هەر تەنها ئەوانە كۆ بكرێنەوە و بكرێن بە بناغەیەكی ئەوتۆ كە زیندووبوونەوەی ئەودنیای لەسەر دابمەزرێت. واتە خواوەندی بەدیهێنەر، لەشی مرۆڤ لەسەر ئەو بنچینە و بناغەیە سەرلەنوێ دروست بكاتەوە.

ئەمە سەبارەت بە: "قیاسی تەمسیلی".

سەبارەت بە "قیاسی عەدلی" شەوە كە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلاَّمٍ للعَبِيدِ﴾ ئاماژەی بۆ دەكات، بە كورتی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

ئێمە زۆر جار لە جیهان و دەوروبەری خۆماندا، دەبینین كە ستەمكار و خراپكاران زۆر بە خۆشی ژیان بەسەر دەبەن، بەڵام ستەم لێكراوان و خواناسان بە پێچەوانەوە بە كولەمەرگی و دەردیسەری ژیانیان لێ دەگوزەرێت. ئنجا كە مردنیش دێت، بەبێ هیچ جیاوازییەك، هەردوو لایان وەكو یەك دروێنە دەكات. جا ئەگەر هەر تەنها ئەمە كۆتاییان بێت، ئەوا ستەم لە مەسەلەكەدا بەرچاو دەكەوێت.

لەبەر ئەوە، پێویستە هەردوو لایان لە ژیانێكی تردا كۆبكرێنەوە و یەكەمیان تۆڵەی خۆی و، دووهەمیشیان پاداشتی خۆی، وەربگرێت. چونكە ئەو خوایەی كە بە شایەتیی ڕێكوپێكیی هەموو بوونەوەران: دادگەر و دانایە و هیچ چەشنە ستەمێكی لێ ناوەشێتەوە، هەرگیزاوهەرگیز "دادگەری" و "دانایی" ئەو خوایە بەو ستەمە ڕازی نابن.

كەواتە دەبێ ژیانێكی نوێ دروست بكات و، هەركەس بەپێی ڕەفتار و هەڵسوكەوتەكانی، تۆڵە یان پاداشتی خۆی بدرێتێ و كۆتایی بە كێشەی هەردوو لایان

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: "كل ابن آدم يأكله التراب إلاّ عَجْبُ الذَّنَب منه خلق ومنه يركب" رواه مسلم وأبوداود وابن ماجه. والعَجب: أصل الذنب. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەكەی "الكلمات"ەوە).

بهێنرێت. چونکە ئەگەر بابای ستەم لێکراو بە چاوی خۆی ئەوەی بینی کە تۆڵەی بۆ سەندراوەتەوە، دەبێت بە ڕەمزێك بۆ دادگەری و، دەچێتە ڕیزی هەموو دیاردە پڕ لە دادگەرییەکانی گشت بوونەوەر و، دانایی خوای گەورەی تێدا دەردەکەوێت و، دەبێت بە براگەورەی بوونەوەرە پڕ لە دانستەکانی ئەم گەردوونە.

بەڵێ، ژیانی ئەم جیهانە هێندە کورتە کە بەشی ئامادەمیزاد ناکات و جێگای دەرکەوتنی هەموو ئامادەیی و لێهاتنەکانی ڕۆحی مرۆڤ و بەروبوومەکانی تێدا نابێتەوە. کەواتە دەبێ ئەم مرۆڤە بۆ جیهانێکی تر بنێررێت. بەڵێ، ناوەرۆك و حەقیقەتی مرۆڤ زۆر گەورە و گرنگە، بۆیە ڕەمزی هەمیشەیی و دەستنیشان کراوی ژیانی هەتاهەتایییە..

هەروەها چییەتی(الماهية)یەکەی لە ڕادەیەکی زۆر بەرزدایە، کەواتە ئەگەر تاوان بکات، تاوانەکەی گەلێ بە گەورە لە قەڵەم دەدرێت.

هەروەها ڕێبازی ژیانی زۆر ورد و جوانە، کەواتە بە بێ ڕێکوپێکی و یاسا، کۆتایی پێ ناهێنرێت و بە لەناوبردن حوکمی لەسەر دەرناکرێت.

بەڵکو:

دۆزەخ دەمی بۆ کردووەتەوە و چاوەڕوانیی دەکات..

هەروەها بەهەشتیش باوەشی بۆ کردووەتەوە.

ئەمەی کە لەم سەرچاوەی دەهەمەدا بە کورتی باسمان کرد، لە ڕاستیی سێ‌هەمی "وتەی دەهەم"دا زۆر بە ڕوونی باس کراوە.

لێرەدا تەنها دوو ئایەتمان بە نموونە هێنایەوە، دەتوانیت بۆ خۆت لە ئایەتە پیرۆزەکانی تری قورئاندا - کە پڕن لە بەڵگەی عەقلی - بگەڕێیت و شتی تر بۆ خۆت دەربهێنیت و بدۆزیتەوە.

* * *

ئەمانەی باس کران (دە) سەرچاوەی وان کە یەقین و بەڵگەی بێ گومان لەسەر حەشر و زیندووبوونەوە بە دەستەوە دەدەن.

جا هەروەك یەقین و بەڵگەی بێ گومان دەریانخست کە زیندووبوونەوە هەیە و، داخوازی ئەو زیندووبوونەوەیە بوون، هەر بەو جۆرە ناوەجوانەکانی خوای گەورەش وەك ناوەکانی: "الحكيم، الرحيم، الحفيـــظ، العـــادل" و زۆربەی ناوە جوانەکانی تری خوای گەورە، داخوازی بوونی قیامەت و پەیدابوونی بەختەوەریی هەمیشەیین و، بە بەڵگەی بەهێز و مەحکەم ڕۆژی دوایی دەچەسپێنن و، هیچ گومانێکی تێدا ناهێڵنەوە، وەك لە وتەی دەهەمدا ئەمەمان چەسپاند.

كه‌واته ئێمه ئه‌وه‌نده به‌ڵگه‌ی به‌هێز و پته‌وی وامان به‌ده‌سته‌وه‌یه له‌سه‌ر زیندووبوونه‌وه و په‌یدابوونی ڕۆژی حه‌شر، كه هیچ شوبهه و گومانێك به هیچ جۆرێ، نه‌توانێت شان له شانی ئه‌و به‌ڵگانه بدات و، جێگای خۆی له دڵماندا بكاته‌وه.

# بنچینه‌ی سێهه‌م

به‌ڵێ، هه‌روه‌ك گومان له داخوازی‌یه‌كانی "حه‌شر"دا نی‌یه، گومان له ده‌سته‌ڵات و توانای ئه‌و كه‌سه‌شدا نی‌یه كه ئه‌م كارانه ئه‌نجام ده‌دات و، هیچ كه‌موكوڕی‌یه‌ك ڕوو ناكاته توانای ئه‌و. چونكه گه‌وره و بچووك له لای ئه‌و یه‌كسانن و دروستكردنی وه‌رزی به‌هار و تاقه‌گوڵێكی به‌لاوه وه‌ك یه‌ك وایه.

به‌ڵێ، ئایا هیچ وه‌هم و خه‌یاڵ و دوودڵی‌یه‌ك ده‌توانێت زیندووكردنه‌وه‌ی دواڕۆژ له ده‌سته‌ڵاتی ئه‌و به‌توانا و خاوه‌ن ده‌سته‌ڵاته‌وه به دوور بزانێت كه ئه‌م گه‌ردوونه به زمانی خۆر و ئه‌ستێره‌كانی ته‌نانه‌ت گه‌ردیله‌كانیشی، شایه‌تی له‌سه‌ر توانست و ده‌سته‌ڵاتی ڕه‌های ئه‌و ده‌ده‌ن؟!

ئه‌و خواوه‌نده به‌ده‌سته‌ڵاته‌ی كه له هه‌موو چه‌رخ و ساڵ و، ته‌نانه‌ت له هه‌موو ڕۆژێكدا جۆره‌ها دنیای گه‌ڕۆك و جیهانی تازه و شتی نوێ و ڕێكوپێك به‌دی ده‌هێنێت و، یه‌ك له دوای یه‌ك له‌سه‌ر ڕووی زه‌وی و ئاسمانه‌كاندا، به‌وپه‌ڕی دانایی، ئاڵوگۆڕیان پێ ده‌كات. به‌م جۆره و به ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی چه‌رخ و ساڵه‌كان، به‌ڵكو ڕۆژه‌كانیش، جیهانی نوێ دروست ده‌كات و، به‌سه‌ر ته‌ناف و مه‌ساری زه‌ماندا هه‌ڵیانده‌واسێت و، به‌مه‌ش مه‌زنیی توانست و ده‌سته‌ڵاتی خۆی ده‌رده‌خات..

ئه‌و خوایه‌ی كه باخچه‌ی وه‌رزی به‌هاری به سه‌دان هه‌زار نه‌خش و نیگاری حه‌شر خه‌ملاندووه و، كردوویه‌تی به تاجێكی جوان و سه‌ری ئه‌و گۆی زه‌وی‌یه‌ی پێ ڕازاندووه‌ته‌وه كه وه‌ك تاقه گوڵێك وایه له‌ناو گوڵزاری بوونه‌وه‌راندا. به‌مه‌ش – ئه‌و خوایه – جوانی و ڕێكوپێكیی به‌دیهێنراوه‌كانی خۆیمان پیشان ده‌دات..

ئایا ئیتر ده‌بێ كێ بێت پركێشی بكات و سه‌باره‌ت به‌م شكۆمه‌نده خاوه‌ن توانایه‌وه بڵێت: چۆن قیامه‌ت دروست ده‌كات؟.. یان چۆن دنیا به‌و دواڕۆژه ده‌گۆڕێت؟

خۆ ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه‌ی كه ده‌فه‌رموێ:

﴿ما خَلْقُكُم ولا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ واحِدَةٍ﴾ (لقمان:٢٨)..

ئەوە دەردەبڕێت کە ئەم خواوەندە بەدەستەڵاتە هیچ شتێکی لە لا گران نییە و، گەورە و بچووکی وەك یەك لە لا ئاسانە و، کۆمەڵێکی زۆری لەژمارەبەدەری بەلاوە وەك تاکێك وایە.

حەقیقەتی ئەم ئایەتەشمان بە پوختی لە کۆتایی "وتەی دەهەم"دا لە پەیامی "خالێك لە نووری ناسینی خوای گەورە" و "مەکتووبی بیستەم"دا باس کردووە. بەڵام لێرەدا بە پوختی لە "سێ" مەسەلەدا ڕوونی دەکەینەوە:

یەکەم: توانستی خوای گەورە شتێکی خۆیی(ذاتي)یە و بە هیچ جۆرێك لاوازی ڕووی تێ ناکات.

دووهەم: ئەو دەستەڵاتە پەیوەندیی بە "مەلەکووتی‌یەتی" شتەکانەوە هەیە، ئەمەش مانای وایە هیچ بەربەستێك ڕێی لێ ناگرێت.

سێهەم: ڕێژەی ئەم دەستەڵاتەش، ڕێژەیەکی یاسایی‌یە. واتە "هەند"ی هەر شتێك لە چاویا وەك "هەموو"ی وایە و، "هەندەکی" و "هەمەکی"یەکانیش لە چاو ئەو دەستەڵاتەدا لە یەك ڕیزدان.

وا ئێستاش ئەم سێ مەسەلەیە، یەك لە دوای یەك، ڕوون دەکەینەوە و دەیانچەسپێنین.

❖ **مەسەلەی یەکەم:** بوونی سیفەتی توانست و دەستەڵات(القدرة) شتێکی پێویستە بۆ زاتی پاك و خاوێنی خوای گەورە.

واتە ئەم سیفەتە بە هیچ جۆرێك لە زاتی پیرۆزی خوای گەورە دوور ناکەوێتەوە و جیا نابێتەوە. کاتێ کە ئەمەمان زانی، دەشزانین کە ئەو شتەی پێچەوانە و دژی توانستە (واتە: نەتوانین و بێ‌دەستەڵاتی) هەرگیز نابێتە سیفەت بۆ ئەو خوایەی کە سیفەتی توانست و دەستەڵاتی بۆ خۆی بڕیار داوە. چونکە ئەگەر وا نەبێت، ئەوا دەبێ دوو شتی دژ بە یەك کۆ بنەوە، دیارە ئەمەش شتێکی مەحاڵە.

لە کاتێکدا کە نەگونجێ "بێ‌دەستەڵاتی" ببێتە سیفەت بۆ خوا، ناشتوانێت ئاوێتەی دژەکەی ببێت کە "توانا و دەستەڵاتە". خۆ کە ئەمەشی نەتوانی، ئەوا دەردەکەوێت کە ئەو دەستەڵاتە خۆیی(القدرة الذاتية)یەی خوای گەورە پلەپلە(مراتب) نی‌یە. چونکە پلەپلەبوون لە هەر شتێکدا بەوە دەبێت کە دژەکەی، بە ڕێژەیەکی کەم یان زۆر، تێکەڵی بوویێت، وەك: پلەکانی "گەرما" کە بە تێکەڵ بوونی ڕێژەیەکی "سەرما" دەردەکەون و، پلەکانی "جوانی"ش کە بە تێکەڵ بوونی ڕێژەیەکی تایبەتیی "ناشیرینی" دەناسرێن... هتد.

به‌ڵام له بوونه‌وه‌ره به‌دیهاتووه‌كاندا كه له به‌شی گونجاوه‌كان(الممكنات)ن، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی پێویستیی زاته‌كان بۆ سیفه‌ته‌كان پێویستی‌یه‌كی ڕاسته‌قینه نی‌یه، ئه‌وا ده‌بینین ئه‌و شتانه‌ی كه دژی یه‌كترین، تێكه‌ڵ به یه‌كتر ده‌بن و، له‌مه‌شه‌وه پله‌كان دروست ده‌بن و ئاڵوگۆڕ و جیاوازی‌یه‌كانیش دێنه كایه‌وه.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له ده‌سته‌ڵاتی ئه‌زه‌لیی خوادا پله و به‌رزی و نزمی نی‌یه، ئه‌وا هه‌ر شتێك ئه‌و ده‌سته‌ڵاته به‌دیی بهێنێت، چ زۆر گه‌وره بێ و چ زۆر بچووك، وه‌كو یه‌ك ده‌بن و به‌لایه‌وه یه‌كسان ده‌بێت.. "ئه‌ستێره‌كان" و "گه‌ردیله‌كان" له‌چاو ئه‌و توانسته‌دا وه‌ك یه‌ك وان و.. زیندووكردنه‌وه‌ی هه‌موو گرۆی مرۆڤ وه‌ك زیندووكردنه‌وه‌ی تاكه كه‌سێك وایه و.. دروستكردنی وه‌رزی به‌هاری وه‌ك دروستكردنی تاقه گوڵێك به‌لاوه ئاسانه.

به‌ڵام ئه‌گه‌ر به‌دیهێنان نه‌درێته پاڵ ئه‌و توانسته ڕه‌هایه و، بدرێته ده‌ستی هۆكاره مادی‌یه‌كان، ئه‌وا دروستكردنی تاقه گوڵێك به ئه‌ندازه‌ی دروستكردنی وه‌رزی به‌هار گران و له‌توانابه‌ده‌ر ده‌بێت!

له په‌راوێزی دواهه‌مین بڕگه‌ی پله‌ی چواره‌می پله‌كانی "الله اكبر"ی مه‌قامی دووهه‌می ئه‌م وته‌یه و.. له "وته‌ی بیست و دووهه‌م" و.. "مه‌كتووبی بیست و دووهه‌م و پاشكۆكه‌ی"دا، به چه‌ندین به‌ڵگه‌ی چه‌سپێنه‌ری بێ گومان ئه‌وه‌مان چه‌سپاند كه:

هه‌ركات به‌دیهێنان(الخلق)ی شتان بدرێته پاڵ خوایه‌كی تاك و ته‌نیا، ئه‌وا دروستكردنی هه‌موو شتێكی به ئه‌ندازه‌ی دروستكردنی یه‌ك دانه شت به‌لاوه ئاسان ده‌بێت. ده‌نا ئه‌گه‌ر به‌دیهێنانی ئه‌و یه‌ك دانه شته بدرێته ده‌ستی هۆكاره مادی‌یه‌كان، ئه‌وا هێنده گران ده‌بێت، كه به ئه‌ندازه‌ی به‌دیهێنانی هه‌موان مه‌سه‌له‌كه ئاڵۆز ده‌رده‌چێت و كێشه‌ی تێدا دروست ده‌بێت.

❖ **مه‌سه‌له‌ی دووهه‌م:** توانستی خوای گه‌وره په‌یوه‌ندیی به دیوی "مه‌له‌كووت"ی شتانه‌وه هه‌یه..

به‌ڵێ، هه‌موو شتێكی ئه‌م بوونه‌وه‌ره وه‌ك ئاوێنه وایه، دوو ڕووی هه‌یه:

یه‌كه‌میان: ڕووی ده‌ره‌وه‌(المُلك) ئه‌م ڕووه وه‌ك ڕووی بۆیه‌كراوی ئاوێنه وایه.

دووهه‌میان: ڕووی ناوه‌وه‌(المَلَكُوت) ئه‌م ڕووه‌یان وه‌ك دیوی پیشانده‌ری سافی ئاوێنه وایه.

ڕووی یه‌كه‌میان، كه ڕووی "مولك"ه"، جێگای چه‌ندین شتی پێچه‌وانه و دژی یه‌كترین كه له‌م ڕووه‌دا كۆبوونه‌ته‌وه. وه‌ك: جوانی و ناشیرینی، چاكه و خراپه، گه‌وره و بچووك، ئاسان و گران... هتد.

جا لەبەر ئەوەی ئەم لایەنەی بوونەوەر بەم جۆرەیە، ئەوا خواوەندی بەدیهێنەری دانا، کاروبارەکانی خۆی لەم ڕووەدا بە چەند هۆکارێکی ڕووکەش داپۆشیوە و، ئەو هۆکارانەی کردووە بە چەند پەردەیەك کە لە پشتیانەوە کاری خۆی ئەنجام دەدات. بۆ ئەوەی دەستی توانستی خوا ڕاستەوخۆ لەو شتە بچووکانەدا دەرنەکەوێت کە بە لای ئەوانەی کەم فامن و تەنها شتی ئاشکرا دەبینن، بە ناشیرین و کەمنرخ دێنە بەرچاویان و، پێیان وایە شیاوی ئەو دەستەلاتە نین. چونکە "عیززەت" و "گەورەیی" خواوەند خواستیان لەسەر شاردنەوەی دەستی توانستی ڕاستەوخۆی خوایە لە پشت ئەو پەردانەوە. بەلام دەبێ ئەوەش بزانین کە لەبەر ئەوەی "تاك و تەنیایی" خوا ڕێگا بە شەریك و هاوبەش نادات، ئەوا کاریگەریی ڕاستەقینەی لەو شتانەشدا بەو هۆکارانە نەداوە، بەلکو کاریگەریی ڕاستەقینە هەر لە لایەنی خوای گەورەی دانا خۆیەوەیە.

بەلام دیوی "مەلەکووت" ڕوویەکی پاك و بێ گەرد و ڕوون(شفاف)ە و، هیچ ڕەنگ و زرق و برقێکی تێکەڵ نابێت. لایەنێکی ئەوتۆیە کە بەبێ بوونی هیچ هۆکارێك تەنها ڕووی لە خوای خۆیەتی. وەك لاکەی تر نییە تا لە ڕێگای زنجیرەی هۆکارەکانەوە شتان ئەنجام بدرێن، چونکە "هۆکار" و "بەهۆکراو" تێکەڵ بەم لایەنە نابن و، هیچ تەگەرەیەك ڕێگا لە شتێکی تر ناگرێت و کۆسپی لە بەردەمدا دانانێت، بەلکو "گەورە" و "بچووك" وەك یەك وان و "خۆر" و "گەردیلە" لە بەرچاویدا برای یەکترین.

لەمەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

دەستەلات و توانستی خوای گەورە تاکە، واتە لە چەند شتێك پێك نەهاتووە. هەروەها خۆیی(ذاتي)یە و، ڕەها و بێسنوورە. پەیوەندیشی بە شتانەوە بە بێ هیچ نێوەند و هۆکارێکە. هەروەها پاك و بێ گەردە و هیچ پەردەیەك بەسەر ڕوویدا دانەدراوە و، دواکەوتن ڕووی تێناکات و، هەرچییەکی بوێ، دەست بەجێ دەیکات. لەبەر هەموو ئەمانە، لە بەرامبەر دەستەلاتی خواوە، گەورە لە بەردەم بچووکدا خۆی نانوێنێت و، کۆمەڵ بەسەر دانە و تاکدا پێش ناخرێت و، شتی گشتی بەسەر بەشێکی خۆیدا خۆی بە گەورەتر نازانێت.

❖ **مەسەلەی سێهەم:** توانستی خوا بە ڕێژەیەکی یاساییە. واتە بە یەك چاو سەیری گەورە و بچووك، کەم و زۆر دەکات.

جا بۆ ئەوەی ئەم مەسەلە ئالۆزە لە زەینی مرۆڤەوە نزیك بخەینەوە، وا چەند نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی دەهێنینەوە. چونکە چەند شتێك لە بوونەوەردا هەن کە گەورە و بچووك و کەم و زۆریان لە لا یەکسانە، وەك:

ڕوونی(الشفافية).. بەرامبەری(المقابلة).. هاوسەنگی(الموازنة).. ڕێکوپێکی(الإنتظـــام).. دەستبەرداری(التجرد).. گوێڕایەڵی(الطاعة).

ئەمانەش نموونەکانن:

**نموونەی یەکەم:** *"ڕوونی - الشفافية"* .

ڕووناکیی تیشکی خۆر هەروەك لە خۆیدا دەردەکەوێت، لەسەر ڕووی دەریا و تەنانەت لەسەر هەموو دڵۆپێکی دەریاشدا دەردەکەوێت.

گریمان ڕووی گۆی زەوی لە وردە شووشە پێکهاتبێت و، هیچ پەردەیەکیش لە نێوان زەوی و خۆردا نەبێت، ئەوا درەوشاندنەوەی ڕووناکی و تیشکی خۆر بەسەر هەموو زەویدا و لە هەموو یەکێکی ئەو وردە شووشانەدا یەکسان دەبێت، بێ ئەوەی جێگا بە یەکتری لێژ بکەن یان لە بەشی یەکتر کەم بکەنەوە! جا ئەگەر وا دابنێین "خۆر" بە هەست و ویستی خۆی کار بکات و هەرچی ڕووناکی و تیشکی خۆی هەیە بە ویستی خۆی بە زەویی بدات، ئەوا ئەو کاتە بەخشینی ڕووناکیی خۆی بە تێکڕای زەوی، بە لایەوە گرانتر نابێت لەوەی کە تەنها بە یەك دانە گەردیلەی ببەخشێت، بەڵکو وەکو یەك ئاسان دەبن.

**نموونەی دووهەم:** *"بەرامبەری - المقابلة"* .

ئەگەر چەند کەسێکی زۆر لە شێوەی بازنەیەکی گەورەدا دانیشتبن و هەریەکەیان ئاوێنەیەکی بەدەستەوە بێت و، لە ناوەڕاستی بازنەکەشدا یەکێك مۆمێکی داگیرساوی بە دەستەوە گرتبێت، ئەوا ڕووناکیی ناوەڕاستی بازنەکە وەك یەك و بە یەك ڕێژە لەناو ئاوێنەکاندا دەردەکەوێت، بە بێ لەناوچوون و کەمبوونەوە و، بێ ئەوەش جێگا بە یەکتری لێژ بکەن.

**نموونەی سێهەم:** *"هاوسەنگی - الموازنة"* .

ئەگەر تەرازوویەکی زۆر گەورە و یەکجار هەستیارمان لە لا بێت و، لە تاکانیدا دوو خۆر، یان دوو ئەستێرە، یان دوو چیا، یان دوو هێلکە، یان دوو گەردیلەی تێدا دابنرێت، ئەوا ئەو هەوڵەی بۆ بەرزکردنەوەی یەکێکیان دەدرێت، هەمان هەوڵە بۆ نزمکردنەوەی ئەوی تریان.

**نموونەی چوارەم:** *"ڕێکوپێکی - الإنتظام"* .

گەورەترین کەشتی - کە ڕێکوپێك بێت - دەتوانرێت وەك بچووکترین بووکە شووشە(ئامێری یاری)ی منداڵان بخرێتە گەڕ و هەڵبسووڕێنرێت.

**نموونەی پێنجەم:** *"دەستبەرداری - التجرد"* .

"میکرۆب" وەك "کەرکەدەن" هەڵگری هەمان ماهییەت و ئەدگار(خصائص)ی "زیندەوەری"یە و، بچووکترین "ماسی" وەك "نەهەنگ"ێکی گەورە دارای هەمان ماهییەت و ئەدگارە. چونکە ماهییەتی ڕووتکراو لە شێوە و ڕوخسار و دەستبەردار لە بەرجەستەبوون و پەیکەرگیری(التجسم)، هەموو گەردیلەکانی لەش - هەر لە بچووکترینی شتی بچووکەوە تا دەگاتە گەورەترینی شتی گەورە - دەگرێتەوە و ڕووی تێدەکات، بێ کەم کردن و بەبێ دابەشبوون.

چونکە ئەدگارەکانی دەستنیشانکاری و(١) سیفاتە ڕواڵەتی‌یەکانی لەش، لەگەڵ ماهییەت و ئەدگاری ڕووتدا تێکهەڵکێش نابن و ئاڵۆزی ناکەن.

**نموونەی شەشەم:** *"گوێڕایەڵی - الطاعة"* .

هەروەك سەرکردەی سوپا دەتوانێت فەرمان بدات و بڵێت: "بڕۆ.. پێشکەوە" و، بەم فەرمانە تەنیا یەك سەرباز بجوڵێنێت و بیخاتە کار و مەشق پێ کردن، دەشتوانێت بە هەمان فەرمان سوپایەکی گەورە بخاتە گەڕ و لە جێگای خۆیدا بیجوڵێنێت!

حەقیقەتی نهێنیی گوێڕایەڵی لەوەدایە کە:

هەروەك بە بینین و تاقیکردنەوە زانراوە، هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا خاڵێکی "کەماڵ"ی هەیە و حەزی پێ دەکات. زیادبوونی ئەم حەزەش "پێویستی" بەرهەم دەهێنێت و، زیادبوونی پێویستیش شەوق و تاسە دروست دەکات و، زیادبوونی شەوق و تاسەش کێشبوون(الانجذاب) پێکدەهێنێت.. جا ڕاکێشان و، شەوق و، پێویستی و، حەزکردن، لەبەر ئەوەی چییەتی(ماهیــة)ی شتانن، ئەوا تۆوی بەجێهێنانی فەرمانە تەکوینی‌یەکانی خواوەندن(٢).

کەماڵی ڕەها(مطلق)ی چییەتی‌یەکانی بوونەوەران "وجوودی موتڵەق"ە (کە خوای گەورەیە). بەڵام کەماڵی هەرکام لە بوونەوەران، "بوون"ە تایبەتی‌یەکەی خۆیەتی. لەبەر

(١) واتە: ئەو تایبەتکاری‌یانەی کە هەر لەشێك لەوی تر جیا دەکەنەوە و دەستنیشانی دەکەن. (وەرگێڕ)
(٢) فەرمانەکانی خوا بە گشتی دوو جۆرن: جۆرێکیان پێیان دەوترێت: فەرمانە شەرعی‌یەکان(الأوامر الشرعية) کە لە سیفەتی "الکلام"ی خواوە دەردەچن. جۆری دووهەمیان: ئەو فەرمانانەیە کە بۆ دروستکردنی بوونەوەران لە لایەن سیفەتی "الارادة"ی خواوە دەردەچن و پێیان دەوترێت: (الأوامر التكوينية) کە بۆ دەربڕینی چۆنێتیی ئەم جۆرە فەرمانە ڕستەی: "کُن، فیکون" بەکار دەهێنرێت. واتە کە خوای گەورە ویستی شتێك بەدی بهێنێت پێی دەفەرموێ: "ببە" ئەویش "یەکسەر دەبێ". (وەرگێڕ)

ئه‌وه‌ش بوونی تایبه‌تیی پێ به‌خشراوه تاكو هه‌ر لێهاتوویی و توانایه‌كی سروشتیی هه‌یه، بیهێنێته ده‌ره‌وه و به كردار ده‌ری ببڕێت[1]. جا گوێڕایه‌ڵیی سه‌رجه‌می بوونه‌وه‌ران بۆ فه‌رمانی: "ببه – كُـن" وه‌كو گوێڕایه‌ڵیی یه‌ك دانه گه‌ردیله وایه، كه به وێنه‌ی ته‌نیا سه‌ربازه‌كه‌ی نموونه‌كه‌ی سه‌ره‌وه‌یه.

ئنجا كاتێ كه بوونه‌وه‌ران گوێڕایه‌ڵیی ئه‌و فه‌رمانه ده‌كه‌ن له لایه‌ن ویستی په‌روه‌ردگاره‌وه بۆیان ده‌رچووه، هه‌موو ئه‌و حه‌ز و پێویستی و ئاره‌زووانه، كه هه‌ركام له‌وانه یه‌كێكن له دره‌وشانه‌وه‌كانی هه‌مان ویستی خوایی، یه‌ك ده‌گرن. ئه‌مه‌ش له ڕاده‌یه‌كی وادایه كه ئاوی ڕوون و ڕه‌وان هه‌ركات فه‌رمانی پێ ده‌درێت ببه‌ستێ، وه‌ها گوێڕایه‌ڵیی تێدا ده‌رده‌كه‌وێت، كه ده‌توانێت ئاسن په‌راش په‌راش بكات!

جا ئه‌گه‌ر ئه‌م شه‌ش نموونه‌یه ئه‌وه‌ی بۆ ڕوون كردبینه‌وه كه هێز و توانا و كرداری بوونه‌وه‌ران چۆنه و تا چ ڕاده‌یه‌كه، له كاتێكدا كه بێ‌هێز و لاواز و كه‌م ده‌سن و، كاریگه‌ریی ڕاسته‌قینه‌شیان له هیچ شتێكدا نی‌یه.. ئه‌وا ده‌بێ له به‌رده‌م ئه‌و ده‌سته‌ڵاته‌ی خواوه‌نددا، كه شوێنه‌واری گه‌وره‌یی‌یه‌كه‌ی به ئاشكرا دیاره، هه‌موو شتێك (به گه‌وره و بچووكه‌وه) یه‌كسان بن.. ئه‌و توانسته‌ی كه ئه‌زه‌لی‌یه و هه‌روه‌ها بێ كۆتاییشه و، بوونه‌وه‌رانی له نه‌بوونه‌وه هێناوه‌ته بوون و هه‌زاران عه‌قڵی له‌مه‌دا سه‌رسام كردووه.

كه‌واته ده‌سته‌ڵاتی خوا هیچ شتێكی به‌لاوه گران نی‌یه.

ده‌بێ ئه‌وه‌شمان له یاد نه‌چێت كه ده‌سته‌ڵات و توانستی ڕه‌ها و گه‌وره‌ی خوا، هه‌رگیز به ته‌رازووه لاوازه‌كانی ئێمه لێك نادرێته‌وه و به‌راورد ناكرێت و هیچ موناسه‌به‌تێكیان له نێواندا نی‌یه. ته‌نها بۆ ئه‌و مه‌به‌سته باس ده‌كرێت كه له تێگه‌یشتن و زه‌ینی مرۆڤه‌وه نزیك بخرێنه‌وه و، زه‌ینی مرۆڤ به شتێكی دووری نه‌زانێت.

**ئاكام و كورته‌ی بنچینه‌ی سێهه‌م:**

مادەم توانستی خوا ڕه‌ها و نه‌بڕاوه‌یه و پێویسته بۆ زاتی پیرۆزی خوای گه‌وره..

مادەم هه‌ر شتێك كه له لایه‌نی "مه‌له‌كووت"ه‌وه ڕوو بكاته ئه‌و ده‌سته‌ڵات و توانسته، به بێ هیچ په‌رده و ڕووكه‌شێك ڕووی تێ ده‌كات..

---

(١) بوون(الوجود) دوو جۆره. یه‌كه‌میان: ئه‌و بوونه‌ی كه له تواناداية(الوجود بالقوة). دووهه‌میان: ئه‌و بوونه‌ی كه له واقیعدا هه‌یه(الوجود بالفعل). بۆ نموونه: سیفه‌تی ئاخاوتن واته قسه‌كردن سیفه‌تێكه له مرۆڤدا هه‌یه، به‌ڵام له كاتێكدا كه بێ‌ده‌نگه، ئه‌وا بوونی ئه‌م سیفه‌ته بوونێكی توانایی(وجود بالقوة)یه، كه له‌و كاته‌شدا مرۆڤ ده‌دوێت و ده‌ست به قسه‌كردن ده‌كات ئه‌وا ئه‌م سیفه‌ته بوونی واقیعی(وجود بالفعل) وه‌رده‌گرێت. (وه‌رگێڕ)

مادەم هەردوو لایەنی هەر شتێك لەچاو ئەو توانستەدا هاوسەنگی یەكترین..

مادەم ئەو ڕێسا سروشتی‌یەی كە خوای گەورە لە گەردووندا دایناوە، گوێڕایەڵی سەرجەم فەرمان و یاساكانی خواوەندە..

مادەم لایەنی "مەلەكووت" لایەنێكی ساف و بێ گەردە و، شتی تایبەتكاری لەوێدا نی‌یە و، هیچ كۆسپێكیش ڕێگای لێ ناگرێت..

لەبەر هەموو ئەمانە، گەورە و بچووك لە بەردەم ئەو توانستەدا وەك یەك وان و، هیچ شتێك - با هەر شتێك بێت - ناتوانێت سەرپێچی لە فەرمانەكانی ئەو بكات. چونكە زیندووكردنەوەی هەموو گیانداران لەودنیادا وەك زیندووكردنەوەی تاقە مێشێك لە بەهاردا بەلایەوە ئاسانە. هەر لەبەر ئەوەشە كە هیچ گومان و دوودڵی و زیادەڕەوی‌یەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا نی‌یە كە دەفەرموێ:

﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُم إلاّ كَنَفْسٍ واحِدَةٍ﴾دا (لقمان:٢٨).

بەم ڕوونبوونەوەیە، ئەوەمان بۆ چەسپا كە ئەو كەسەی ئەم كارانە ئەنجام دەدات، لەوپەڕی توانست و دەستەڵاتدایە و هیچ شتێك ناتوانێت ڕێی هیچ كارێكی لێ بگرێت!

# بنچینەی چوارەم

هەروەك لە باسەكانی پێشوودا زانیمان كە چەند هۆیەكی ئەوتۆ هەن داخوازی بوونی قیامەت و زیندووبوونەوەی مرۆڤ بن و، زانیشمان ئەو كەسەی ئەم كارە ئەنجام دەدات خاوەنی توانست و دەستەڵاتە.. هەروەها دەبێ بیشزانین كە ئەم دنیایە حەشر و قیامەتی لەباردا هەیە و شیاویەتی.

ئەم دەعوایەشمان "واتە شیاویی دنیا بۆ حەشر و قیامەت" چوار مەسەلەی تێدایە:

*یەكەم*: مردنی ئەم دنیایە كارێكی مومكینە و مەحاڵ نی‌یە.

*دووهەم*: ڕوودانی ئەم مردنە لە ڕاستی و واقیعدا.

*سێهەم*: زیندووبوونەوەی دنیا لە پاش مردن و، ئاوەدان بوونەوەی لە شێوەی دواڕۆژدا شتێكی مومكینە.

*چوارەم*: ڕوودانی واقیعیی ئەم زیندووبوونەوە و ئاوەدان كردنەوەیە.

❑ **مەسەلەی یەكەم:** (مردنی ئەم جیهانە و لەناوچوونی بوونەوەران شتێكی مومكینە).

چونكە ئەگەر هەر شتێك یاسـای ڕەخسین(قـانون التكـامل) بیگرێتـەوە، ئـەوا لـە هـەموو حاڵەتێكی‌دا لە نەش و نمادایە. ئەم نـەش و نماكردنـەش ئـەوە دەگەیـەنێت كـە ئـەو شتە لـە هـەر حاڵەتێكی‌دا تەمـەنێكی سروشتیی هەیـە، واتـە هـەر كام لـەو حاڵەتانـە ئەجـەلێكی سروشتی و كاتێكی دیاری كراوی هەیـە بۆ تـەواوبوون و كۆتـایی پێ هـاتنی. كەواتـە هیـچ شـتێك نی‌یـە بتوانێت لە مردن ڕزگاری ببێت. ئەمەش شتێكە بـە بینین و بۆ گـەڕان(الاستقراء) چەسپاوە و هیچ گومانێكی تێدا نی‌یە.

بەڵێ، هەروەك مرۆڤ، كە جیهانێكی بچووكە، ناتوانێت لە مردن دەرباز ببێت، بەهـەمان جۆر ئەم جیهانەش – كە مرۆڤێكی زەبەلاحە – لە دەست مردن ڕزگاری نابێت، بەڵكو دەبێ بمرێت و پاشان زیندوو بكرێتەوە. یان دەخەوێت و پاشان چاوەكانی بەسەر دیمـەنی بەرەبـەیانی حەشردا دەكاتەوە.

هەروەك درەخت نوسخەیەكی بچووكـی بوونەوەرانـە و نـاتوانێت لـە دەسـت پتوركـان و دارزان دەربـاز ببێـت، بـە هـەمان جـۆر زنجـیرەی بوونـەوەرانیش كـە لـە درەختـی دروستبووان(شجرة الخليقة)ەوە پەیدا بوون، ناتوانن خۆیان لەو مردن و لەناوچوونە ڕزگار بكەن، كە بۆ مەبەستی ئاوەدانكردنەوە و تازەكردنەوەیە.

جا ئەگەر دنیا، پێش ئەجەل و تەواوبوونی ماوەكەی خۆی، كارەساتێكی ڕووخێنەر، یـان نەخۆشی‌یەكی خاریجی – بە ئیزنی خوا خۆی – نەیەتە ڕێی، یـاخود خـوای گـەورە خـۆی ئـەم ڕێسایەی بوونەوەر تێك نەدات، ئەوا هەر بە حسابێكی زانستی دەبێ ڕۆژێك بێتـە كایـەوە كـە زایەڵەی ئەم دەنگەی تێدا بزرنگێتەوە:

﴿**إِذَا الشَّمسُ كُوِّرت ۞ وَإِذَا النُّجُوم انكَدَرَتْ ۞ وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ**﴾ (التكوير: ١-٣).

﴿**إِذا السّماءُ انْفَطَرَتْ ۞ وَإِذَا الكَواكِبُ انْتَثَرَتْ ۞ وَإِذَا البِحَارُ فُجِّرَتْ**﴾ (الإنفطار: ١-٣).

ئیـتر ئـەو كاتـە بـە ئیـزنی خـواوەنـدی ئـەزەلی و خـاوەن توانسـت، واتـا و نهێنی‌یـەكانی ئـەم ئایەتانە دەردەكەون و، ئـەم دنیایـە – كـە وەك مرۆڤێكـی گـەورە وایـە – دەكەوێتـە گیـاندان و هاوار و، پرخە و ناڵەی لـێ هەڵدەستێت و، پاشان دەمرێت.. ئنجا بە فـەرمانی خـوای گـەورە زیندوو دەكرێتەوە!

■ **مەسەلەیەكی ڕەمزیی ورد:**

هـەروەك بایـەخدان بـە وشـە و ئەستووركردنی ئـەم لایەنـە زیـان بـە نـاوەڕۆك و واتاكـەی دەگەیەنێت..

هەروەك کاکڵ و ناوەرۆك لەسەر حسابی توێکڵ و ڕوخسار بەهێز دەبن..

هەروەك ڕۆح لە پێناوی لەشدا لاوازی ڕووی تێ‌دەکات و، لەشیش بەهۆی هەوڵدانەوە بۆ بەهێزکردنی ڕۆح لاواز دەبێ..

بە هەمان جۆر، ئەم جیهانە چڕەی ئێمەش هەتا زیاتر لایەنەکانی ژیان کاری تێدا بکات، زیاتر لە ڕێگای چوونی‌دا بۆ جیهانی نەرم و ناسکی قیامەت، نەرمتر دەبێت و ئامادەیی پەیدا دەکات.

توانا و دەستەڵاتی خواوەندیش – کە بە جۆرێکی سەرسووڕهێنەر لەکاردایە – ڕووناکیی ژیان بەسەر لایەنە وشك و کوژاوە و مردووەکاندا، بڵاو دەکاتەوە و، بەمەش نەرم دەبن و دەتوێنەوە و، ئەو لایەنانە بە ڕووناکیی ژیان ڕۆشن دەکاتەوە، بۆ ئەوەی ڕاستی و ناوەرۆکیان بەهێز بکات و "ئامادەیی" بۆ ژیانی ئەو جیهانە نەرم و جوان و ناسکەی قیامەت پەیدا بکەن.

بەڵێ، حەقیقەت و ناوەرۆك – با زۆر لاوازیش بن – هەرگیز نامرن، بە پێچەوانەی ڕوخسار و توێکڵ و وێنەی دەرەوە. بەڵکو "حەقیقەت" هەر لەناو وێنە و شکڵ و توێکڵ و ڕوخسارەکاندایە و، تا زیاتر بمێنێتەوە و بەرەو پێشتر بڕوات، پتر ڕوون و گەورەتر دەبێت. بە پێچەوانەی توێکڵ و وێنەی دەرەوە، کە کۆن دەبێت و دادەڕزێت، پاشان بە شێوەیەکی نوێ خۆی دەردەخاتەوە، بۆ ئەوەی لە کاڵا و بەرگێکی شیاوی حەقیقەتدا بێت، ئەو ڕاستی‌یە چەسپاوەی کە هەردەم لە گەشەکردندایە.

کەواتە ئەم دوانە (حەقیقەت و شێوە ڕواڵەتی‌یە دەرەکی‌یەی) لە ڕێژەیەکی پێچەوانەی یەکتریدان. واتە ئەگەر یەکێکیان بەرەو کەمی بڕوات، ئەوی تریان لە زیادبووندا دەبێت و، تا وێنەی دەرەوە چڕتر و زبرتر بێت، ئەوا ناوەرۆك نەرمتر و تەنکتر دەبێت و، تا وێنەی دەرەوە لاوازتر بێت، بە هەمان ڕێژە، ناوەرۆك بەهێزتر دەبێت.

ئەمەش یاسایەکی گشتی‌یە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە یاسای "ڕەخسین" دەیانگرێتەوە.

کەواتە بێ هیچ گومانێك کاتێك دێت کە "بە ئیزن و فەرمانی خوا" جیهانی بینراوی ئێستامان – کە وێنە و توێکڵی ڕاستیی بوونەوەرانە – لەت لەت ببێت و، پاشان لە شێوەیەکی جوانتردا نوێ ببێتەوە. ئەو کاتەش حیکمەتی ئەم ئایەتە پیرۆزە دێتەدی کە دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرضُ غَيْرَ الأَرْضِ... ﴾ (إبراهيم:٤٨).

لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە: مردن و تێکچوونی ئەم دنیایە شتێکی مومکینە و هیچ گومانێکی تێدا نی‌یە.

❑ **مه‌سه‌له‌ی دووهه‌م:** (ئه‌م دنيايه ده‌مريْت و كاول ده‌بيْت).

به‌لْگه‌ش له‌سه‌ر ئه‌م مه‌سه‌له‌يه زۆره:

يه‌كده‌نگی(اجماع)ی هه‌موو ئايينه ئاسمانی‌يه‌كان..

شايه‌تيی هه‌موو سروشتيْكی ساغ و بیْ عه‌يب..

ئالْوگۆڕی ناو بوونه‌وه‌ران..

مردنی جيهانی زينده‌وه‌ران و ئه‌و شتانه‌ی له‌م بوونه‌وه‌ره‌دا له جموجوولْدان، كه به ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی چه‌رخ و سالْه‌كانن..

هه‌موو ئه‌مانه، به‌لْگه‌ن له‌سه‌ر مردنی ئه‌م دنيايه‌ی خۆشمان كه وه‌ك مه‌نزلْگای ڕيْبواريْك وايه.

ئه‌گه‌ر ده‌ته‌ويْت ته‌سه‌ووری مردن و سه‌ره‌مه‌رگی ئه‌م دنيايه بكه‌يت به‌و جۆره‌ی كه ئايه‌ته‌كانی قورئانی پيرۆز ئاماژه‌يان بۆ كردووه، ئه‌وا به وردی سه‌رنج بده له‌وه‌ی كه:

هه‌موو به‌شه‌كانی ئه‌م گه‌ردوونه، به ياسايه‌كی زۆر به‌رز و ورد و، به شيْوه‌يه‌كی ناديار و ناسك، په‌يوه‌ندی‌يان له‌گه‌لْ يه‌كتردا هه‌يه و په‌يوه‌ستی يه‌كترين. ئه‌مه‌ش به ڕاده‌يه‌كی وايه كه ئه‌گه‌ر بيْت و ته‌نها يه‌ك قه‌باره(جرم) له‌ناو ئه‌واندا فه‌رمانی "كُنْ" يان: "له خولگه‌ی خۆت ده‌ربچۆ" له لايه‌ن خوای گه‌وره‌وه وه‌ربگريْت، ئه‌وا جيهان ده‌كه‌ويْته سه‌ره مه‌رگه‌وه و، سه‌رجه‌می ئه‌ستيْره و قه‌باره و ته‌نه ئاسمانی‌يه‌كان ده‌كه‌ون به يه‌كدا و، به ئه‌ندازه‌ی ده‌نگی مليۆنه‌ها تۆپ ده‌نگ و نه‌عره‌ته‌يان لیْ په‌يدا ده‌بيْت و، پارچه ئاگر و پزيسكی وه‌هايان لیْ ده‌بيْته‌وه و له‌م فه‌زا فراوانه‌دا بلاْو ده‌بنه‌وه كه هه‌ريه‌كه‌يان به ئه‌ندازه‌ی قه‌باره‌ی ئه‌م زه‌وی‌يه‌ی خۆمان به‌لْكو گه‌وره‌تريش بيْت. چياكانيش هه‌پروون هه‌پروون ده‌بن و، ده‌رياكانيش ئاويان تيْدا نامێنيْت و يه‌كپارچه ده‌بن به كلْپه‌ی ئاگر و، زه‌ويش له جيْگای خۆی‌دا ته‌خت ده‌بيْت!

به‌م جۆره، خوای گه‌وره‌ی خاوه‌ن توانستی ئه‌زه‌لی، ئه‌م بوونه‌وه‌ره به‌م پارچه مردووانه ده‌جوولْيْنيْت و ڕايانده‌ژه‌نيْت و تيْكه‌لْی ئه‌م سه‌ره‌مه‌رگه‌يان ده‌كات. ئيتر بوونه‌وه‌ران پاك ده‌كريْنه‌وه و هه‌ريه‌كه‌يان له‌وانی تر جيا ده‌بيْته‌وه. دۆزه‌خيش به كه‌ره‌سه و سه‌رنشينانی سوور ده‌كريْته‌وه و، به‌هه‌شتيش ده‌رده‌كه‌ويْت و نزيك ده‌خريْته‌وه و ئه‌وه‌ی له‌گه‌لْی‌دا بگونجيْت ده‌چيْته ناويه‌وه.. ئيتر ئه‌و كاته جيهانی ئه‌ودنيا، بۆ بوونی هه‌ميشه‌يی ديْته كايه‌وه.

❑ **مه‌سه‌له‌ی سیْهه‌م:** (گونجانی زيندووكردنه‌وه‌ی ئه‌و جيهانه‌ی كه ده‌مريْت).

ئه‌وه‌بوو پيْش ئيْستا له بنچينه‌ی دووهه‌مدا چه‌سپاندمان كه "توانستی خوای گه‌وره" هيچ ناته‌واوی‌يه‌كی نی‌يه و هۆی زۆر به‌هيْزيش بۆ دروستبوونی قيامه‌ت هه‌يه. هه‌روه‌ها ئه‌وه‌شمان

چەسپاند کە ئەم مەسەلەیە یەکێکە لە مەسەلە گونجاو(ممكنات)ەکان.

جا مادەم مەسەلەیەکی گونجاو بێت و، هۆی بەهێز و گرنگیش بۆ دروستبوونی ببێت، ئنجا لە لایەکی تریشەوە ئەو کەسەی کە ئەم کارە ئەنجام دەدات لەوپەڕی توانستی ڕەها(مطلق)دا بێت، ئەوا ئیتر نابێ لەو گۆشەیەوە سەیری مەسەلەکە بکرێت کە: شتێکی گونجاوە و بەس، بەڵکو دەبێ وا بزانرێت کە شتێکە واقیعە و ڕووی داوە!

• **سەرنجێکی ڕەمزی:**

ئەگەر بە وردی سەرنج لەم گەردوونە بدەین، دەبینین دوو ماك هەن کە ڕەگیان داکوتاوە و بە هەموو لایەکدا بڵاو بوونەتەوە. وەك: "خێر و شەڕ"، "جوانی و ناشیرینی"، "سوود و زیان"، "کەماڵ و ناتەواوی"، "ڕووناکی و تاریکی"، "ڕێگای ڕاست و گومڕایی"، "ڕووناکی و ئاگر"، "ئیمان و کوفر"، "گوێڕایەڵی و سەرپێچی"، "ترس و خۆشەویستی"..

جا ئەنجام و شوێنەواری ئەم شتە دژ بە یەکانە تێکەڵ بە یەکتری دەبن و دەکەون بە یەکدا و، لەمەوە ئاڵوگۆڕە هەمەجۆر و بەردەوامەکان دەردەخەن، وەك بلێی خۆیان بۆ جیهانێکی تر ئامادە بکەن. کەواتە دەبێ ئاکام و کۆتایی ئەم دوو ماکە دژ بەیەکە ڕادە و سنوورێکی ببێت و لەوێ لە یەکتر جیا ببنەوە و، هەریەکەیان لە شێوەی "بەهەشت" یاخود "دۆزەخ"دا دەربکەون.

جا لەبەر ئەوەی جیهانی هەمیشەیی ئەولا، لە جیهانە تێکچووە لەناوچووەکەی ئەم لا دروست دەکرێتەوە، ئەوا بە یەقینی ماکە سەرەکیەکانی ئەم جیهانە، بۆ جیهانی هەمیشەیی ئەولا دەنێررێن.

بەڵێ، "بەهەشت و دۆزەخ" بەروبوومی ئەو لقە درێژ و بڵاوەن کە لە درەختی دروستبووان(شجرة الخليقـــــة)ەوە پەلی هاویشتووە و تا دەگاتە "ئەبەد" بڵاو بووەتەوە. هەروەها ئەم دوانە کۆتایی زنجیرەی بوونەوەران و، گۆم و گەنجینەی لافاوی کاروبارە خواییەکانن و، دوو درەوشانەوە(التجلـي)ن لە درەوشانەوەکانی "لوتف" و "قەهر"ی خوای گەورە.

جا هەرکات کە دەستی قودرەت بە توندی ئەم گەردوونەی ڕاتەکاند، ئەوا هەریەکە لەو دوو گۆمە بەو ماددە و ماکانە پڕ دەبێت کە لەگەڵیدا دەگونجێن.

**ڕوونکردنەوەی ئەم سەرنجە ڕەمزیە:**

خواوەندی دانای ئەزەلی، بە خواستی دانایی و چاودێریی ئەزەلیی خۆی، ئەم دنیایەی بە جۆرێك بەدی هێناوە کە جێگا و مەڵبەندی تاقیکردنەوەی مرۆڤ بێت و، ببێت بە ئاوێنەیەك

بۆ پیشـاندانی درەوشـانەوەی نـاوە جوانـەكانی و، لاپـەڕەی تیانووسـینی قەڵـەمی "قـەدەر" و "قودرەت"ی خۆی بێت.

ئەم تاقیكردنەوانەش هـۆن بۆ نـەش و نمـاكردن.. ئـەویش هۆیـە بـۆ دەركـەوتنی ئامـادەیی و لێهاتنی هەر شتێك.. ئەویش هۆیـە بۆ دەركـەوتنی توانـا و لێهاتنـەكانی مـرۆڤ.. كـە ئـەویش دەبێـت بـەهۆی دەركـەوتنی ڕاسـتی‌یە نیسـبی‌یەكان.. ئـەوانیش هـۆن بـۆ دەركـەوتنی درەوشانەوەی نەخشە ڕەنگینەكانی ناوە جوانەكانی بەدیهێنەری گەورە و پەروەردگار، تـاكو ئەم بوونەوەرانە شێوە و ڕوخساری نووسراوەكانی خوای گەورەی "صەمـەد" و پـەروەردگار بگرنەخۆ.

كەواتە نهێنیی تەكلیف و ئـەرك پێ‌سپاردن و حیكمـەتی تاقیكردنـەوەی مـرۆڤ لـەوەدایـە كە: ناوەرۆك و حەقیقەتی ڕۆحیانەتە پاكەكان، كە وەك ئـەڵماس وان، پـاك دەكەنـەوە و، لـەو ڕۆحیانەتانە جیایان دەكەنەوە كە وەك خەڵووز ڕەش داگیرساون.

بەم نهێنی‌یانە و هاوچەشـنیان كـە بـاس كـران و، بـەو دانایی‌یـە ورد و جوانانـەش كـە ئێمـە لێیان بێ‌ئاگاین، خوای بەتوانای دانا ئەم جیهانەی لەم شێوەیەدا دروست كردووە و، ویسـتی بە ئاڵوگۆڕی ئەم جیهانە بووە و، لەبەر ئەم ئاڵوگۆڕەش شـتانی دژ بـە یـەكی ئاوێتـەی یـەكتری كـردووە. ئـەوەتا سـوودەكان لـەگـەڵ زیانـەكاندا تێكـەڵ كـراون و، خراپـە لەگـەڵ چاكـەدا تێهەڵكێش كراوە و، شتە ناشیرینەكانیش لەگـەڵ جوانـەكاندا كۆكراونەتـەوە.. بـەم چەشـنە، دەستی توانستی خوای گەورە، ئەم شتە دژبەیەكانەی پێكەوە شێلاوە و، هـەموو بوونـەوەرانی والـێ كـردووە كـە شـوێنكەوتەی یاسـاكانی ڕەخسین(التكامل) و ئـاڵوگۆڕ بـن و لێیـان لا نەدەن.

جا هەركات كە:

كۆڕی ئیمتیحان تەواو بوو..

كاتی تاقیكردنەوە دوایی هات..

ناوە جوانەكانی خوای گەورە كاری خۆیان جێ‌بەجێ كرد..

قەڵەمی قەدەری خوا لە نووسین بووەوە..

توانستی خوا نەخش و نیگاری داهێنانی خۆی تەواو كرد..

بوونەوەران فەرمانبەرێتیی ئەستۆیان ئەنجام دا..

بەدیهێنراوان ئەركی سەرشانی خۆیانیان تەواو كرد..

هەرچی شت هەیە واتا و ناوەرۆكی خۆی دەربڕی..

ئەم دنیایە نەمامی ئەودنیای سەوز كرد..

سەرزەوی هەموو موعجیزاتی توانستی بەدیهێنەری بەتوانا و شتە لەعادەت بەدەرەکانی سنعەتی ئەوی پیشان دا..

ئەم جیهانە فانی‌یەش، تابلۆ هەمیشەیی‌یەکانی لەسەر شریتی زەماندا چەسپاند..

ئەوا ئەو کاتە دانستی هەمیشەیی و چاودێریی ئەزەلیی خواوەندی شکۆمەند، خواستیان بەوە دەبێت کە:

ڕاستی‌یەکانی ئەنجامی ئەو تاقیکردنەوەیە و.. ڕاستی‌یەکانی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوا و.. حەقیقەتی نووسراوەکانی قەڵەمی قەدەر و.. بنچینەی نەخش و نیگاری داهێنانی توانست و سنعەتی خوای گەورە و.. سوود و ئاکامی فەرمانبەرێتیی بوونەوەران و.. پاداشتی ئەو فەرمانبەرێتی‌یانە و.. ڕاستیی واتا و ناوەرۆکی وشەکانی کتێبی گەورەی گەردوون، دەربکەون..

هەروەها خواستیان بەوە دەبێت کە گوڵی تۆوی ئامادەیی‌یە سروشتی‌یەکان بپشکووتێن و.. دەرگاکانی دادگای گەورە بکرێنەوە و.. وێنەی ئەو دیمەنە میسالی‌یانەی کە لە دنیادا گیراون، پیشان بدرێن و.. پەردەی هۆکارە ئاشکراکان بدڕێنرێن و.. هەموو شتێك ڕاستەوخۆ سەر بۆ فەرمانی خوای خۆی کەچ بکات..

ئەو ڕۆژەی کە ویستی خواوەند ڕوو دەکاتە ئەوەی کە: ئەو ڕاستی‌یانە دەربخرێن و پەردە لەسەر ڕوویان هەڵبماڵرێت، بۆ ئەوەی بوونەوەران لە ئاڵوگۆڕ و لەناوچوون ڕزگار بکات و هەمیشەیی‌یان پێ ببەخشێت و، ئەو شتانەش کە دژ بە یەکترین و ئەو هۆکارانەش کە ئاڵوگۆڕ دروست دەکەن، لێك جیا بکرێنەوە..

لەو ڕۆژەدا:

خوای گەورە - بە حەتمی - قیامەت دەهێنێتە کایەوە و، کۆتایی بە هەموو کارەکان دەهێنێت بە دەرکەوتنی ئاکامەکانیان. ئیتر بە گوێرەی ئەو ئاکام و ئەنجامانە دۆزەخ شێوەیەکی ترسێنەر و هەمیشەیی وەردەگرێت و، دانیشتووانی خۆی بە: ﴿**وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ**﴾ (یس:٥٩) دەترسێنێت و، بەهەشتیش بە خۆشی و جوانی و دڵڕفێنی بۆ هەتاهەتایی خۆی دەڕازێنێتەوە و، دەرگاوانەکانی ڕوو لە دانیشتووانی دەکەن و دەڵێن:

﴿**سَلامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فادْخُلُوهَا خَالِدِينَ**﴾ (الزمر:٧٣).

ئیتر - لەو ڕۆژەدا - خوای گەورەی بەتوانای دانا، بوونی هەمیشەیی بەم دوو جێگایە دەبەخشێت و، هەرگیز ئاڵوگۆڕ و نەمان و پیری و فەوتانیان بەسەردا ناهێنێت. چونکە ئەو کاتە هیچ هۆکارێك بۆ ئاڵوگۆڕ نامێنێت کە سەری لە فەوتان و لەناوچوونەوە دەردەچێت.

وه‌ك له "پرسیاری دووهه‌می، مه‌قامی یه‌كه‌می، وته‌ی بیست و هه‌شته‌م"دا به‌ڵگه‌ی له‌سه‌ر هێنراوه‌ته‌وه.

❑ **مه‌سه‌له‌ی چواره‌م:** (زیندووبوونه‌وه شتێكی حه‌تمی‌یه).

به‌ڵێ، دوای ئه‌وه‌ی "دنیا" مرد و كاول بوو، سه‌رله‌نوێ له شێوه‌ی "دوارِۆژ"دا زیندوو ده‌كرێته‌وه. ئه‌و به‌دیهێنه‌ره به‌توانایه‌ش كه بۆ یه‌كه‌م جار دروستی كردووه، هه‌ر ئه‌و له یه‌كه‌م جار جوانتر دروستی ده‌كاته‌وه و، ده‌یكات به یه‌كێك له مه‌نزڵگاكانی قیامه‌ت.

باشترین به‌ڵگه‌ش له‌سه‌ر ئه‌وه:

یه‌كه‌م: قورئانی پیرۆزه، كه ئایه‌ته‌كانی به هه‌زاران به‌ڵگه‌ی عه‌قڵی "زیندووبوونه‌وه" ده‌چه‌سپێنن..

هه‌روه‌ها: هه‌موو كتێبه ئاسمانی‌یه‌كانی تر، كه له‌م مه‌سه‌له‌دا له‌گه‌ڵ قورئان یه‌ك ده‌گرنه‌وه و تیای‌دا هاوده‌نگن..

هه‌روه‌ها: هه‌موو سیفه‌ته‌كانی: شكۆمه‌ندی(الجلال) و جوانی(الجمال) و، گشت ناوه جوانه‌كانی تری خوای گه‌وره‌ش، به‌ڵگه‌ی گومان لێ نه‌كراون له‌سه‌ر ڕوودانی ئه‌م زیندووبوونه‌وه‌یه..

هه‌روه‌ها: خواوه‌ندی میهره‌بان له هه‌موو ئه‌و فه‌رمانانه‌ی‌دا كه بۆ پێغه‌مبه‌رانی خۆی – علیهم السلام – ناردوون، به‌ڵێنی زیندووكردنه‌وه و قیامه‌تی داوه. جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به‌ڵێنی داوه، ئه‌وا به حه‌تمی به‌ڵێنه‌كه‌ی ده‌باته سه‌ر. (سه‌یری ڕاستیی نۆهه‌می وته‌ی ده‌هه‌م بكه)..

هه‌روه‌ها: هه‌واڵدانی پێغه‌مبه‌رمان حه‌زره‌تی "محه‌مه‌د ﷺ" كه هه‌زاران موعجیزه له‌سه‌ر ڕاستگۆیی ئه‌و هه‌یه، ئه‌م هه‌واڵانه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ كه مزگێنیی زیندووبوونه‌وه‌مان ده‌ده‌نێ، له‌گه‌ڵ هه‌واڵدانی پێغه‌مبه‌ره‌كانی تر و ئه‌ولیا و پیاوچاك و صیدیقه‌كاندا، یه‌ك ده‌گرنه‌وه..

ئه‌مه جگه له‌وه‌ی كه هه‌موو ئایه‌ته ته‌كوینی‌یه‌كانی ئه‌م گه‌ردوونه، هه‌مان مزگێنی و هه‌واڵمان پێ ڕاده‌گه‌یه‌نن.

**ئه‌نجام:**

هه‌موو ڕاستی‌یه‌كانی "وته‌ی ده‌هه‌م – په‌یامی حه‌شر" و، گشت به‌ڵگه‌كانی په‌یامی "لاسیما" له مه‌قامی دووهه‌می وته‌ی بیست و هه‌شته‌م، كه به زمانی عه‌ره‌بی له "المثنوي العربي النوري"دا نووسراون.. هه‌موو ئه‌مانه، به‌وپه‌ڕی بێ گومانی و وه‌ك هه‌ڵهاتنی خۆر چه‌سپاندوویانه كه:

(پاش ئاوابوونی ژیانی دنیا، خۆری "حه‌قیقه‌ت" له شێوه‌ی ژیانێكی تری نوێدا هه‌ڵدێته‌وه)!

بەم جۆرە، لە سەرەتای ئەم چوار بنچینەیەوە تا ئێستا هەرچی‌یەکمان ڕوون کردەوە، تەنها یارمەتی وەرگرتن(استمداد)ێك بوو لە ناوی "الحکیم"ی خوای گەورە و، سوودێك بوو کە لە بەرەکەت و لێشاوی نووری قورئانی پیرۆز وەرمان گرت، تەنها بۆ ئەوەی کە "دڵ" وەری بگرێت و، "نەفس" تەسلیم ببێت و "عەقڵ"یش ملی بۆ کەچ بکات..

دەنا دەبێ ئێمە چی بین تا قسە لە مەسەلەیەکی وەهادا بکەین کە دەبێ هەر تەنها خاوەنی ئەم دنیایە قسەی تێدا بکات؟ ئەو کەسەی کە بەدیهێنەر و خاوەنی ئەم گەردوونەیە. ئێمە ئەوەندەمان بۆ هەیە کە ملکەچ و گوێڕایەڵ بین، چونکە کاتێ کە ئەو دەدوێت و قسە دەکات لەو زیاتر کێ مافی دوان و قسەکردنی هەیە؟

خۆ ئەم خوایەی کە بەدیهێنەر و خاوەنی بوونەوەرە، هەر لە ئەزەلەوە ڕوو لە هەموو جۆرەکانی بوونەوەر دەکات لە گۆڕەپانی مزگەوتی دنیا و قوتابخانەی سەر زەوی‌دا، کە لە پشت پەردەی هەموو چەرخەکانەوەن، ڕوویان تێ دەکات و هەموو بوونەوەر دەلەرێنێتەوە و دەفەرموێ:

بسم الله الرّحـــمن الرّحيم

**﴿إذا زُلزِلَتِ الأَرضُ زِلزَالَهَا ۞ وَأَخرَجَتِ الأَرضُ أثقالَهَا ۞ وَقَالَ الإِنسَانُ مَالَها ۞ يَومَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخبارَهَا ۞ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحى لَهَا ۞ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النّاسُ أَشْتَاتاً لِيُرَوا أَعمالَهُمْ فَمَنْ يَعْمَلْ مِثقالَ ذَرَّةٍ خَيراً يَرَهُ ۞ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾** (الزلزلة).

بە چەشنێکی وەهاش لەگەڵیاندا دەدوێت کە هەموو بوونەوەران دەخاتە تاسەوە و، دەفەرموێ:

**﴿وَبَشِّرِ الذينَ آمَنوا وَعَمِلُوا الصَّالِحات أَنّ لَهُمْ جَنات تَجري مِن تَحتِها الأَنهارُ كُلّمَا رُزِقُوا مِنها مِنْ ثَمَرةٍ رِزقاً قالُوا هَذا الذي رُزِقْنا مِنْ قَبْلُ وأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهاً وَلَهُمْ فِيها أَزواجٌ مُطَهَّرةٌ وَهُمْ فِيها خَالِدونَ﴾** (البقرة:٢٥).

کەواتە ئێمە ئەوەندەمان لەسەرە گوێ بیست و گوێڕایەڵی ئەو فەرموودەیە بین کە لە لایەن خاوەنی موڵکی دنیا و قیامەتەوە دەرچووە و بڵێین:

- آمَنّا.. وصَدَّقْنا..

**﴿سُبْحانكَ لا عِلْمَ لَنا إلاّ مَا عَلّمتَنا إِنّكَ أَنتَ العَليمُ الحَكيمُ﴾.**

**﴿رَبّنَا لا تُؤَاخِذْنا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنا﴾.**

اللّهم صلّ على سيّدنا محمّد وعلى آل سيدنا محمد، كما صلّيت على سيدنا ابراهيم وعلى آل سيدنا ابراهيم، إنّك حميد مجيد.

**(ئەو وتەیەی کە مەتەڵ و تەلیسمی گەردوونی حەل کرد و، نهێنی‌یەکی مەزنی قورئانی پیرۆزی ئاشکرا کرد)**

# وتەی سی‌هەم

**(پیتێکە لە کتێبی مەزنی "من".. خاڵێکە لە دەریای گەورەی "گەردیلە")**

ئەم وتەیە لە دوو مەبەست پێکهاتووە:

**مەبەستی یەکەم:** لە بارەی چییەتی و ئەنجامەکانی "من"ەوە[1] دەدوێت.
**مەبەستی دووهەم:** باسی جموجووڵ و فەرمانبەری‌یەکانی گەردیلە دەکات.

# مەبەستی یەکەم

بسمِ اللهِ الرَّحمن الرحيم

**﴿إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّموات وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْها وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾** (الأحزاب:٧٢)

ئاماژە بۆ تەنها یەك دانە گەوهەر لە گەوهەرەکانی گەنجینەی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکەین، کە بریتی‌یە لەوەی: ئەو ئەمانەتەی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان هەڵیان نەگرت و نەیانویست بیخەنە ئەستۆی خۆیانەوە، چەندین واتا و ڕووی زۆری هەیە، یەکێك لەو واتا و ڕووانە بریتی‌یە لە: "من".

بەڵێ، "من" تۆوێکە درەختێکی "تووبا"ی نوورانی گەورە و، درەختێکی "زەققووم"ی سامناکی لێ سەوز بووە و، هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی لەسەر بێت - تا

---

(١) وشەی "من" لەم پەیامەدا مامۆستا نوورسی بە واتای "دەروونی بەخۆ ئاگای مرۆڤ" بەکاری هێناوە و، مەبەست ئەو "من"ە نی‌یە کە هاوواتای "EGO"یە و، دەروونی ناوەکی دەردەبڕێت و، هیچ پەیوەندی‌یەکی بەم باسەوە نی‌یە. (وەرگێڕ)

ئەم کاتەی ئێستامان ئەم دوو درەختە بە هەموو لایەکی جیهانی مرۆڤدا لق و پەلیان هاویشتووە.

پێش ئەوەی لەم "ڕاستی"یە فراوانە ڕۆبچین و لێی بکۆڵینەوە، پێشەکی‌یەك دەنووسین کە تێگەیشتنی ئەو ڕاستی‌یەمان بۆ ئاسان دەکات:

# پێشەکی

"من" کلیلێکە، گەنجینە شارراوەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورە و، لایەنە داخراوەکانی گەردوون دەکاتەوە. "من" لە خۆیدا تەلیسمێکی سەیر و سەرسووڕهێنەر و موعەممایەکی نامۆیە، بەڵام ئەم تەلیسمە سەیر و موعەمما نامۆیە بە ناسینی "چییەتی‌یەکەی" حەل دەبێت و، پاشان مەتەڵی گەردوون و دەرگای گەنجینەکانی جیهانی "وجوب"یش دەکرێنەوە[1].

لە پەیامێکی عەرەبیمدا بە ناوی: "شمة من نسيم هداية القرآن" ئەوەندەی کە پەیوەندیی بەم مەسەلەیەوە ببێت، بەم جۆرە باسمان کردووە:

"بزانە! کلیلی جیهان بە دەست مرۆڤەوەیە و لەناو خودی خۆیدایە، چونکە دەرگاکانی بوونەوەران هەرچەند لە ڕواڵەتدا کراونەتەوە، بەڵام لە ڕاستی‌دا داخراون. خواوەند کلیلێکی بە ئەمانەت لە مرۆڤدا داناوە کە هەموو دەرگاکانی جیهانی پێ دەکرێنەوە و، تەلیسمێکیشی داوەتێ کە گەنجینە شارراوەکانی بەدیهێنەری گەردوون دەکاتەوە، کلیلەکەش ئەو "من"ەیە کە لە مرۆڤدا هەیە. بەڵام ئەم "من"ەش لە خۆیدا مەتەڵ و تەلیسمێکی داخراوە، جا ئەگەر بەهۆی ناسینی چییەتیی "مەوهووم" و نهێنیی بەدیهاتنی ئەم "من"ە دەرگاکەیت کردەوە، ئەوا تەلیسمی گەردوونیشت لێ دەکرێتەوە"[2].

ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

خوای گەورە ئەمانەتێکی بە دەستی مرۆڤ سپاردووە، ئەویش ئەو "من"ەیە کە چەندین ئاماژە و نموونەی تێدایە ڕێنمایی مرۆڤ دەکەن بۆ "ڕاستی"ی وەسفەکانی پەروەردگارێتیی مەزن و کاروبارە پیرۆز و بێ‌گەردەکانی ئەو خواوەندە. واتە: "من" یەکەیەکی پێوانەیە بەهۆیەوە وەسفەکانی پەروەردگارێتی و کاروبارە خوایی‌یەکان دەناسرێن.

---

(١) مەبەست لە وجوب، "واجب الوجود"ە کە خوای گەورەیە. واتە: دوای کردنەوەی گرێ‌کوێرەی "من" مرۆڤ کلیلێکی دەست دەکەوێت کە دەرگای جیهانی ناسینی خواوەندی پێ بکاتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) بڕوانە: ص٣٢١ "المثنوي العربي النوري" الطبعة المحققة الثانية ص ٣٢٧-٣٢٨.

شتێکی ئاشکرایشە لای هەموان کە مەرج نی‌یە "یەکەی پێوانە" بوونی ڕاستەقینەی بێت. بەڵکو دەکرێت بە گریمان و ئەندێشە، یەکەیەکی پێوانە پێك بهێنرێت، وەك هێڵە گریمان کراوەکانی زانستی ئەندازە. واتە پێویست ناکات "من" بە ڕاستی و بێ گومانی و جۆرێکی زانستی‌یانە "بوون"ی ڕاستەقینەی بێت.

پرسیار: بۆچی ناسینی سیفەتە پیرۆز و ناوە جوانەکانی خوای گەورە، پەیوەستەی "منێتی"ی مرۆڤە[1]؟

وەڵام: شتی ڕەها و گشتگیر(المحیط) خاوەنی سنوور و کۆتایی نی‌یە، لەبەر ئەوەیشە کە هیچ شێوەیەکی نادرێتێ و هیچ حوکمێکیشی لەسەر دەرنا کرێت، چونکە بواری دەستنیشان کردنی تێدا نی‌یە و خاوەنی وێنە و شێوەیەکی تایبەتی نی‌یە، لەبەر ئەمەیە کە چییەتی‌یەکەی ناناسرێت و نازانرێت.

بۆ نموونە: ڕووناکیی بەردەوام کە تاریکیی ئاوێتە نەبێت، هەتا بە تاریکی‌یەکی ڕاستەقینە یان وەهمی سنووری بۆ دانەنرێت، پێی نازانرێت.

سیفەتە پیرۆزەکانی خوای گەورە - وەك: العلم والقدرة - و ناوە جوانەکانی خواوەندیش - وەك: الحکیم، الرحیم - بە هەمان جۆرن. چونکە لەبەر ئەوەی ڕەها و بێ سنوورن و دەوری هەموو شتێکیان داوە و هیچ هاوبەش و دژێکیشیان نی‌یە، ئەوا ناتوانرێت بە تەواوی لە هەموو لایەکەوە بزانرێن و دەوریان بگیرێت یاخود بە شتێك ببەسترێن و دەستنیشان بکرێن. کەواتە چییەتی‌یەکەیان نازانرێت و هەرگیز هەستیان پێ ناکرێت. لەبەر ئەوە، پێویست دەکات، بە گریمان، سنوورێکی ئەندێشەیی بۆ ئەو سیفەت و ناوە ڕەهایانە دابنرێت، تاکو ئەو سنوورە وەهمی‌یە ببێت بەهۆی تێگەیشتن لەوان. چونکە لە ڕاستی‌دا ئەو سیفەت و ناوانە سنوور و کۆتایی ڕاستەقینەیان نی‌یە.

جا "منێتیی مرۆڤ" واتە "من" لە مرۆڤدا، دەبێت بەو سنوورە و ناسێنەری ئەو سیفەت و ناوە ڕەها و بێ سنوورانە، چونکە مرۆڤ پەروەردگاری‌یەکی وەهمی و، موڵکداری‌یەکی گریمان‌کراو و، توانا و، زانیاری‌یەك، تا سنوورێکی دیاری کراو، لە خۆی‌دا شك دەبات، بەمەش سنوورێکی وەهمی بۆ چەندین سیفەت و ناوی دەورەدەر و ڕەها دادەنێت.

بۆ نموونە: خۆی بە خۆی دەڵێت: (لێرەوە تا ئەوێ هی منە، لەولاتر هی ئەو سیفەتانەیە). واتە جۆرە دابەش‌کردنێك لە نێوان شتاندا دادەنێت و، بەم سنوور دابەش‌کردنەش خۆی بۆ ئەوە ئامادە دەکات کە وردە وردە بەو پێوەر و تەرازووە بچووك و ساکارانەی خۆی، لە چییەتیی ئەو سیفەتە بێ سنوورانە تێ‌بگات.

(١) مەبەست لە وشەی "منێتی" لێرەدا ئەو واتایەی سەرەوەیە، نەك خۆپەرستی. (وەرگێڕ)

بۆ نموونە: بە بۆنەی ئەو پەروەردگاریتی‌یە وەهمی‌یەی کە لە بازنەی مولکی خۆی‌دا بۆ خۆی بڕیاری دەدات، لە پەروەردگاریتی‌یە ڕەهاکەی بەدیهێنەری خۆی لە بازنەی "مومکینات"دا[1] تێ‌دەگات..

هەروەها بە مولکداری‌یە ڕواڵەتی‌یەکەی خۆی، مولکداریی ڕاستەقینەی بەدیهێنەریشی دەزانێت و، بە خۆی دەڵێت: "هەروەك من خاوەنی ئەم خانووەم، خواوەندی بەدیهێنەریش خاوەنی ئەم گەردوونەیە"..

هەروەها بە زانینە هەندەکی‌یەکەی خۆی، لە زانستی ڕەهای خوای گەورە تێ‌دەگات..

هەروەها بە کارامەیی‌یە دەستکەوتوو و هەندەکی‌یەکەی خۆی، لە وردەکاری‌یە ناوازە و بێ وێنەکانی بەدیهێنەری مەزن تێ‌دەگات. بۆ نموونە: خۆی بە خۆی دەڵێت: (هەروەك من ئەم خانووەم کردووە و ڕێکم خستووە، هەروەها دەبێ خانەی دنیاش بنیاتنەر و ڕێکخەرێکی ببێت).

بەم چەشنە، لە "من"دا هەزاران بار و سیفەت و هەست و شعوور هەن، هەزاران نهێنیی داخراویان تێدایە کە دەتوانن - تا ڕادەیەك - مرۆڤ بۆ هەموو سیفەت و کاروبارە پڕ لە دانایی‌یەکانی خواوەند ڕێنمایی بکەن و ڕوونیان بکەنەوە بۆی.

واتە: "من" خۆی لە خۆی‌دا واتایەکی سەربەخۆی نی‌یە، بەڵکو ڕێ‌پیشاندەرێکە بۆ واتای غەیری خۆی، بە چەشنی ئاوێنە وایە کە ڕەنگی وێنەکان دەداتەوە و، وەك یەکەی پێوانە و، ئامێری دەرخستن(آلـة استكشـاف) و واتای "حەرفی"[2] وایە. کەواتە "من" موویەکی هەستیارە لە پەتی ئەستووری بوونی ئادەمیزاد و.. تاڵێکی باریکە لە چنراوی بەرگی چییەتیی مرۆڤ و.. پیتی "ئەلف"ە لە پەڕاوی کەسێتیی ئادەمیزاددا، بە چەشنێك کە ئەو پیتە دوو ڕووی هەیە:

یەکێکیان ڕووی لە "چاکە و بوونە". "من" لەم ڕووەدا تەنها ئەوەی پێ دەکرێت کە چیی پێ دەبەخشرێت وەری بگرێت و بەس. چونکە لەبەر ئەوەی لەم ڕووەدا دەستی کورتە، ئەوا ناتوانێت هیچ شتێك بەدی بهێنێت و هیچ کارێك ئەنجام بدات.

---

(١) جگە لە خوا هەموو شتێکی تر پێی دەوترێت: "مومکین" لەبەر ئەوەی هەردوو لای بوون و نەبوونی یەکسانە، چونکە دەکرێ ببێت و دەشکرێ نەبێت. خۆ ئەگەر هۆی بوونی بۆ ڕەخسا و بوونی پێ‌بەخشرا، پێی دەوترێت: "حادیث". بەڵام خواوەند پێی دەوترێت: "واجب الوجود" واتە: هەر دەبێ ببێت و بوونی پێویستە، چونکە ئەو "بوون" بە "مومکینات" دەبەخشێت، گەر ئەو نەبێت، شتانی تریش نابن. "موستەحیل"یش بە غەیری "واجب" و "مومکین" دەوترێت. (وەرگێڕ)

(٢) لە ڕێزمانی عەرەبی‌دا "حەرف" بەوە پێناسە دەکرێت کە: خۆی مانای سەربەخۆ بۆ خۆی بەدەستەوە نادات، بەڵکو واتاکەی بە غەیری خۆیەوە بەندە و واتای شتی تر لێك دەداتەوە. (وەرگێڕ)

ڕووەکەی تر: ڕووی لە "خراپە"یە و شت بەرەو "نەبوون" دەبات. "من" لەم ڕووەدا بکەر و خاوەن کردارە و، هەرچی دەکات خۆی خاوەن و بەرپرسیاریەتی.

پاشان چییەتی "من" وەك هی "حەرف" وایە، واتای شتێکی تری غەیری خۆی دەگەیەنێت. چونکە پەروەردگاریتییەکەی شتێکی ئەندێشەییە و، "بوون"یشی ئەوەندە لاوازە کە ناتوانێت خۆی هیچ شتێك هەڵبگرێت و هیچ شتێکی لە کۆڵ بنرێت. بەڵکو تەنها تەرازوویە کە سیفەتەکانی خواوەند، کە ڕەها و گشتگیری هەموو شتێکن، ڕوون دەکاتەوە، بە چەشنی پێوەری گەرمی و پێوەری هەوا و گشت پێوەر و تەرازووەکانی تر وایە کە ئەندازە و پلەی شتانی تر دەردەخەن و ڕوونیان دەکەنەوە.

ئەو کەسەی بەم جۆرە لە چییەتیی "من" تێدەگات و، ملکەچی دەبێت و، بەپێی داخوازییەکانی ڕەفتار دەکات، ئەوا مژدەی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾ (الشمس:٩) دەیگرێتەوە و، بە ڕاستی سپاردەکەی ئەستۆی بەجێ دەهێنێت و، پاشان بە دووربینی "من" ڕاستیی بوونەوەران دەبینێت و لەو کار و فرمانانەی ئەنجامیان دەدەن تێدەگات. هەر کاتێکیش لە "ئاسۆکان"ی دەرەوە زانیاری بۆ ناوەوەی "دەروون"ی بێن، ئەوا "من" تەسدیقیان دەکات و، ئنجا ئەو زانینانە دەبن بە چەند زانستێکی ڕووناك و دانایی ڕاست لە دەروونداو، نابن بە تاریکایی بێمەبەستی(العبثية) تیایدا.

کاتێ "من" فەرمانبەریی خۆی بەم چەشنە بەجێ هێنا ئەوا واز لە پەروەردگاریی وەهمی و موڵکدارییە گریمانکراوەکەی دەهێنێت، کە جگە لە: یەکەی پێوانە هیچی تر نییە. ئنجا هەموو موڵکێك بۆ خوای گەورە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "له الملك، وله الحمد، وله الحكم، وإليه ترجعون"[(١)] ئیتر پۆشاکی بەندایەتیی ڕاستەقینە لەبەر دەکات و بە پلەی بڵندی: ﴿أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾دا سەردەکەوێت.

بەڵام ئەگەر "من" حیکمەتی بەدیهێنانی خۆی لە بیر چووەوە و، بە واتای "ئیسمی"[(٢)] بۆ خۆی ڕوانی و، فەرمانبەریی سروشتیی سەرشانی واز لێ هێنا و، لەو باوەڕەدا بوو کە خۆی خاوەنی خۆیەتی، ئەوا خیانەت لە سپاردەکەی ئەستۆی دەکات و، ئەم هەڕەشەیەی خواوەند دەیگرێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾ (الشمس:١٠).

بەڵێ، مەترسیی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان لە هەڵگرتنی ئەمانەت و ئەو سامەی لێیان نیشت سەبارەت بە هاوبەش بڕیاردان(شرك)ێکی وەهمی و گریمانکراو، لەم

(١) واتە: موڵك و سوپاسگوزاری و فەرمانڕەوایی هەر بۆ خواوەندە و هەمووتان لە ئەنجامدا بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە. (وەرگێڕ)

(٢) لە ڕێزمانی عەرەبیدا "ئیسم" بەوە پێناسە دەکرێت کە: بۆ خۆی دارای واتایەکی سەربەخۆیە. (وەرگێڕ)

ڕووەی"منێتـی"یـەوە بـووە کـە هـەموو جۆرەکـانی هاوبـەش بڕیـاردان و خراپکـاری و گومڕاییەکانی لـێ دەوەشێتەوە.

بەڵێ، هەرچەند "من" ئەلفێکی باریك و تاڵێکی وردی ناسك و هێڵێکی گریمان کراوە، بەڵام ئەگەر چییەتییەکەی نەزانرێت، ئەوا بە چەشنی گەشەسەندنی تۆو لە ژێر خاکدا، ئەویش بە پەنامەکی گەشە دەکات و بەرە بەرە گەورە دەبێت تا بە هەموو لایەکی "بوون"ی مرۆڤدا بڵاو دەبێتەوە و وەکو هەژدیهایەکی زەبەلاحی لێ دێت مرۆڤەکە هەڵدەلووشێت و ئنجا ئەو مرۆڤە، بە هەموو لایەنە ناسك و گشت هەستەکانیەوە، دەبێت بە یەکپارچە "من"!

پاشان "منێتی"ی جۆر و ڕەگەزی مرۆڤیش ئەوەندەی تر پەرەی پێ دەسێنێت و، گیانی هاوڕەگەزی و نەتەوایەتیش پتر فووی تێدەکات و، بە پشتبەستنیش بەم "منێتی"یە ئەوەندەی تر ئەستوور دەبێت، تاکو وەك شەیتانی لێ دێت و دەبێت بە نەیاری فەرمانەکانی خوای گەورە و سنگیان لێ دەردەپەڕێنێت.

پاشان بەپێی ئارەزووەکانی، سەیری هەموو کەس و شتێك وەك خۆی دەکات و، بەم چەشنە موڵکی خوای گەورە بەسەر ئەو شتانە و هۆکارەکاندا دابەش دەکات و، بەرەو شیرکێکی گەورە پێی دەترازێنێت و واتای ئەم ئایەتەی بە تەواوی تێدا دەردەکەوێت کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (لقمان:١٣). چونکە ئەو کەسەی چل دیناری دەوڵەت بدزێت، ناچارە سەر و درەم بە هاوەڵەکانی بدات تاکو چاولەبەریان بکات و کارەکەی بە ناڕەوا دانەنێن! بە هەمان جۆر ئەو کەسەش کە دەڵێت: (من خاوەنی خۆمم) بێ هیچ گومانێك پڕ بەدەم دەڵێت و باوەڕیشی وایە کە: (هەموو شتێك خاوەنی خۆیەتی)!

بەم جۆرە "من" لەم بارودۆخەیدا، کە خیانەتکردنە لەو سپاردەیەی خراوەتە ئەستۆیەوە، سەرانسەر نوقمی نەفامی و نەزانی بووە، تەنانەت لەم بارەیدا لە هەموو کەسێك نەزانترە و گەوزاوی ناو نەزانییەکی وەها ئاڵۆزە کە سەر و بنی دیار نییە، با هەزاران هونەر و زانستیش بزانێت! چونکە هەموو ئەو ڕووناکی و زانستانەی لەمەڕ ناسینی خوا کە بە گشت لایەکی گەردووندا بڵاو بوونەتەوە و بیر و هەستەکانی ئەم وەریان دەگرن، لە "دەروون"ی ئەم مرۆڤە نەزانەدا شتێك شك نابەن بیانسەلمێنێت و ڕووناکیان بکاتەوە و مانەوە و بەردەوامییان پێ بدات. لەبەر ئەوە، ئەو زانست و خواناسییانە، لە دەروونی ئەمدا دەتوێنەوە و دەبن بە تاریکاییەکی گەلێ چڕ و ئەستوور. چونکە هەرچییەك لەو زانیارییانە بۆ ناو دەروونی ئەم بێن، یەکسەر ڕەنگی تاریکی دەروونی ئەم وەردەگرن، تەنانەت ئەگەر داناییەکی بەرزی جوانیش بێت، ئەم هەر لە دەروونی خۆیدا پۆشاکی

"بێمەبەستیی ڕەها"ی دەکاتە بەر. چونکە ڕەنگی "من" لەم بارەدا هاوبەش بڕیاردان و دەست بەتاڵکردنی بەدیهێنەرە لە سیفەتە مەزنەکانی و، ئینکاری کردنی "بوون"ی ئەوە. بەڵکو ئەگەر گشت گەردوون پڕ ببێت لە بەڵگەی ڕوونی بێ گومان و چرای ڕێنمایی، هێشتا دادی ئەو خاڵە تاریکەی "من" نادات و، ئەو هەموو ڕووناکی‌یانەی بۆ دەروونی دێن ئەم سەروبڕ دایاندەپۆشێت و نایەڵێت هیچیان دەربکەون!

لە وتەی "یازدەهەم"دا بە درێژی باسی "منێتی"ی مرۆڤمان لە ڕووی "واتای حەرفی‌یەوە" کردووە و، بە چەشنێکی بێ گومان چەسپاندوومانە کە چۆن ئەو چییەتی و منێتی‌یە تەرازوویەکی هەستیارن بۆ گەردوون و، پێوەرێکی ڕاست و ورد و سەرنەکەرن و، پێڕستێکی دەورەدەر و گشتی و، نەخشەیەکی تەواو و، ئاوێنەیەکی کۆکەرەوەی ئەو شتانەن کە پیشانیان دەدەن و، هەڵسەنگاندنێکی گشتین. ئەو کەسەی دەیەوێت بە درێژی لەمە ئاگادار بێت، با بگەڕێتەوە سەیرێکی ئەو پەیامە بکات.

لێرەدا کۆتایی بە پێشەکی‌یەکە دەهێنین و، بەو درێژەیەی کە لەو پەیامە ناوبراوەدا هەیە، وازدەهێنین.

برای خوێنەرم!

ئەگەر بە تەواوی لەم پێشەکی‌یە تێ گەیشتوویت، ئەوا فەرموو با پێکەوە بڕۆینە ناوجەرگەی خودی "ڕاستی"یەکە:

مێژووی مرۆڤایەتی، لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی لەسەر بێت - تا ئێستا، دوو تەوژمی گەورە و دوو زنجیرە بیری تێدایە کە بە درێژایی کات و سەردەم و چەرخەکان بەردەوام دێن و دەڕۆن و، وەك دوو درەختی گەورە وان کە لق و پەلیان بۆ هەموو لایەك و گشت چینێکی مرۆڤایەتی هاویشتووە.

یەکەمیان: زنجیرەی پێغەمبەرێتی و ئایینە.

ئەوی تریان: زنجیرەی فەلسەفە و حیکمەتە(١).

هەرکات ئەم دوو زنجیرەیە یەکیان گرتبێت و تێکەڵی یەکتری بووبن، واتە: لە هەر کات و سەردەمێکدا فەلسەفە بەدەم ئایینەوە ڕۆشتبێت و ملی بۆ کەچ کردبێت و گوێڕایەڵی بووبێت، ئەوا مرۆڤایەتی بووژاوەتەوە و ژیانێکی کۆمەڵایەتیی خۆش و شادمانی

---

(١) لێرە بەولاوە، لە هەر شوێنێکی ئەم پەیامەدا وشەی (فەلسەفە و حیکمەت) هاتە ڕێمان مەبەست پێی هەموو ئەو زانستانەن کە پەیوەندی‌یان بە ئایینەوە نەبێت و لەو ڕێیەوە وەرنەگیرابن. (وەرگێڕ)

بەسەر بردووە.. هەر کاتێکیش کەلێن کەوتبێتە نێوانیانەوە و لە یەکتری جیابووبێتنەوە، ئەوا هەرچی نوور و خێر و چاکەیە لە دەوری زنجیرەی پێغەمبەرێتی و ئاییندا و، هەموو شەڕ و شۆڕ و گومڕاییەکانیش لە دەوری زنجیرەی فەلسەفەدا کۆبوونەتەوە.

با ئێستا بناغە و بنچینەی هەریەك لەو دوو زنجیرەیە بدۆزینەوە:

زنجیرەی ئەو فەلسەفەیەی کە پشتی لە ئایین هەڵکردووە، شێوەی درەختێکی چەپەڵی زەققوومی وەرگرتووە کە تاریکیی شیرك و گومڕایی بە دەوری خۆیدا بڵاو دەکاتەوە، بە رادەیەك کە ئەم درەختە لە لقی: "هێزی ژیری"دا بەروبوومی سروشتپەرست و ماددییەکانی بە دەستی ژیریی مرۆڤ بەخشیوە و، لە لقی "هێزی تووڕەیی و زەبروزەنگ"یشدا بەری نەمروود و فیرعەون و شەددادەکانی[1] بە سەری مرۆڤدا کوتا و، لە لقی "هێزی ئارەزووە ئاژەڵییەکان"یشدا بەری بتان و ئەوانەی پێ گەیاند و گەشەی پێ سەندن کە لافی خوایەتییان لێ دەدا.

هەر لە تەنیشتی ئەم درەختە چەپەڵەی زەققوومەوە، درەختی تووبای "بەندایەتی بۆ خوای گەورە" کە زنجیرەی پێغەمبەرێتییە، سەوز بوو و گەشەی کرد و، چەندین بەروبوومی بەتام و پاکی لە باخ و بێستانی گۆی زەویدا هێنایەبەر و، بە چەشنی چەند چەپکێك بەری نزیك لە گرۆی مرۆڤی نزیك خستنەوە و، لە لقی "هێزی ژیری"دا بەری پێغەمبەران و صیددیقان و ئەولیا و پیاوچاکانی پێ گەیاند، هەروەك لە لقی "هێزی دوورخەرەوەی زیانەکان"دا چەندین کاربەدەستی دادگەر و پادشای مەلائیکەت ئاسای پاکی هێنایەبەر و، لە لقی "هێزی ڕاکێشەری سوودەکان"یشدا چەندین مرۆڤی دەستڕەنگینی سەخاوەتمەند و، جوامێر و، ڕەوشت و شێوە جوان و، دەست و داوێن پاك و خاوێنی بەرهەم هێنا، بە ڕادەیەك ئەم درەختە دەری خست کە (مرۆڤ لە ڕاستیدا بەرزترین و بەنرخترینی بەری درەختی گەردوونە).

جا ڕەگ و بناغەی ئەم درەختە پیرۆزە و ئەو درەختە چەپەڵە، هەردوو لا و هەردوو ڕووەکانی "من"ن! واتە: "من" کە بوو بە تۆوی بنچینەیی ئەو دوو درەختە، هەردوو ڕووەکەی بوون بە بناغە و ڕەگ و بنجی هەریەك لەو دوانە. ئەمەش بەمەی خوارەوە ڕوون دەکەینەوە:

---

(١) بەڵێ، فەلسەفەی کۆنی میسر و بابل بوو کە گەیشتە ڕادەی زانینی سیحر، یان ئەوەی بە سیحر دەزانرا - چونکە تاقمێکی تایبەتی دەیانزانی - ئەم فەلسەفەیە بوو کە فیرعەون و نەمروودەکانی لە باوەشی خۆیدا گۆش کرد و پێی گەیاندن، هەروەك زۆنگاو و لیتاوی "فەلسەفەی سروشتی"ش بوو کە جێی بتەکانی لە مێشکی فەیلەسووفە کۆنەکانی یۆناندا کردەوە و بتپەرستیی لەمەوە هێنایە کایەوە. بە ڕاستی ئەو کەسەی پەردەی سروشت بەری چاوی گرتبێت و لە بینینی نووری خوا بێبەشی کردبێت، "خوایەتی" بە هەموو شتێك دەبەخشێت و پاشان بەسەر خۆیشیدا زاڵی دەکات! (دانەر)

"پێغه‌مبه‌رێتی" ڕوویه‌كی "من" وه‌رده‌گرێت و ده‌ڕوات.. "فه‌لسه‌فه"ش دێت و ڕووه‌كه‌ی تری "من" له‌گه‌ڵ خۆی‌دا ده‌بات.

○ **ڕووی یه‌كه‌م:** كه‌ ده‌ڕوانێته‌ ڕاستی‌یه‌كانی پێغه‌مبه‌رێتی، سه‌رچاوه‌ی به‌ندایه‌تیی بێ‌گه‌رد و خاوێنه‌ بۆ خوای گه‌وره‌. واته‌ "من" له‌م ڕووه‌دا:

ده‌زانێت كه‌: به‌نده‌ و گوێڕایه‌ڵی خوای په‌رستراویه‌تی و.. تێده‌گات له‌وه‌ی كه‌: چییه‌تی‌یه‌كه‌ی "حه‌رفی"یه‌، واتای غه‌یری خۆی ڕاده‌گه‌یه‌نێت و.. باوه‌ڕی به‌وه‌ هه‌یه‌ كه‌: بوونی خۆی، شوێنكه‌وته‌ی بوونی یه‌كێكی تری غه‌یری خۆیه‌تی، كه‌ به‌دیی ده‌هێنێت و.. ده‌زانێت كه‌: شتان به‌ چه‌شنێكی "وه‌همی" موڵكی ئه‌ون، واته‌ موڵكداری‌یه‌كی كاتی و ڕواڵه‌تی هه‌یه‌، كه‌ به‌ ڕوخسه‌ت و فه‌رمانی موڵكداری ڕاسته‌قینه‌ی خۆی پێی دراوه‌.. هه‌روه‌ها ده‌زانێت كه‌: خۆی له‌ ڕاستی‌دا سێبه‌ره‌ نه‌ك ڕاستی‌یه‌كی ڕه‌سه‌ن. واته‌: به‌دیهێنراوێكی "مومكین"ی لاوازه‌و، سێبه‌رێكی بێ‌تینه‌ و، ڕه‌نگده‌ره‌وه‌ی ڕاستی‌یه‌كی پێویست و ڕه‌وایه‌.. فه‌رمانبه‌ری‌یه‌كه‌شی: گوێڕایه‌ڵی پڕ هه‌ست و شعووره‌ بۆ خوای خۆی، چونكه‌ پێوه‌رێكه‌ بۆ ناسین و زانینی سیفه‌ته‌ ڕه‌هاكانی به‌دیهێنه‌ری، بۆ ئه‌وه‌ی له‌ كاروباره‌ خواییی‌یه‌كان تێبگات.

پێغه‌مبه‌ران - درووودیان له‌سه‌ر بێت - و شوێنكه‌وتووانیان له‌ ئه‌ولیا و پیاوچاكه‌ پاكه‌كان، له‌م ڕووه‌وه‌ ته‌ماشای "من"یان كردووه‌ و بۆیان ڕوانیوه‌و، به‌م جۆره‌ ڕاستی‌یه‌كه‌یان دیوه‌ و په‌ی‌یان پێ بردووه‌و، هه‌رچی موڵكه‌ به‌ ده‌ستی خاوه‌نی هه‌موو موڵكێكیان سپاردووه‌ كه‌ خواوه‌ندی گه‌وره‌ی شكۆمه‌نده‌و، هه‌ر هه‌موویان دانیان به‌وه‌دا ناوه‌ كه‌ ئه‌و خواوه‌نده‌ موڵكداره‌، چ له‌ موڵك و دارایی و، چ له‌ په‌روه‌ردگارێتی و، چ له‌ خوایه‌تی‌دا، هاوبه‌ش و هاووێنه‌ی نی‌یه‌و، هه‌ر ئه‌وه‌ كه‌ ئه‌وه‌نده‌ به‌رز و بڵنده‌ پێویستی به‌ هیچ شتێك، نه‌ وه‌زیر و نه‌ یاریده‌ده‌ر، نه‌بێت و، خوایه‌كه‌ هه‌موو شتێكی به‌ده‌سته‌ و توانای به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا هه‌یه‌و، "هۆكاره‌كان"یش چه‌ند په‌رده‌یه‌كی ڕواڵه‌تین و به‌ڵگه‌ و ڕێپیشانده‌ری توانا و مه‌زنیی ئه‌ون، "سروشت"یش ته‌نها شه‌ریعه‌تی فیتری و كۆمه‌ڵه‌یه‌ك یاسای كارگێڕی ئه‌وه‌ له‌ گه‌ردووندا، بۆ مه‌به‌ستی ده‌رخستن و پیشاندانی توانا و مه‌زنیی خۆی دایناوه‌.

ئه‌م ڕووه‌ ڕووناكه‌ نوورانی‌یه‌ جوانه‌، وه‌ك تۆوێكی زیندووی پڕ له‌ واتا و دانایی وایه‌، خوای گه‌وره‌ دره‌ختی تووبای به‌ندایه‌تیی لێ سه‌وز كردووه‌ و پێی گه‌یاندووه‌ كه‌ چڵ و لق و په‌ل و پۆ پیرۆزه‌كانی بۆ هه‌موو لایه‌كی جیهانی مرۆڤایه‌تی هاویشتووه‌و، به‌ چه‌ندین به‌روبوومی پاك و خاوێن و جوان و ڕووناك، كه‌ تاریكیی ڕابوردوویان ته‌فروتوونا كردووه‌،

رازاندوویەتەوە و، بە ڕاستی چەسپاندوویەتی کە ئەو کاتە دوور و درێژەی ڕابوردوو گۆڕستانێکی سامناکی بەرین و گۆڕەپانی ترسناکی لە سێدارەدان نی‌یە، وەك فەلسەفە وای دەبینێت! نەخێر.. بەڵکو یەکێکە لە باخچەکانی ڕووناکی بۆ ئەو "گیانانە"ی کە کۆڵی قورسی سەرشانیان داناوە تاکو بە سەربەستی ئەم دنیایە بەجێ بهێڵن. ڕابوردوو لەم ڕوانگەیەوە، خولگەی چەندین نوور و پلیکانەی ڕووناکی پلە پلەی ئەو گیانانەن کە لەم دنیادا و لە ئاسۆی مردنەوە ئاوا دەبن تاکو کۆچ بۆ ئەودنیا و ئایندە گەشاوەیە و بەختەوەریی هەمیشەیی، بکەن.

○ **بەڵام ڕووی دووهەمی** "من": فەلسەفە وەری گرت و، بە واتای "ئیسمی" بۆی ڕوانی. واتە: فەلسەفە دەڵێت: "من" بۆ خۆی دارای واتای خۆیەتی.

"من" بەم پێیە، داخوازی ئەوەیە کە:

واتاکەی لە خۆیدایە و، بۆ خۆی و لە پێناوی خۆی‌دا کار دەکات و.. "بوون"ی خۆی بە بوونێکی ڕەسەن دادەنێت و بە سێبەری بوونێکی تری دانانێت، واتە: لای وایە خۆیەتی‌یەکی تایبەتیی بە خۆیەوە هەیە و.. وا گومان دەبات کە: خاوەن مافە لە ژیاندا و، لە بازنەی جموجووڵی‌دا خاوەنی موڵکە و، ئەم گومانەی خۆشی بە ڕاستی‌یەکی دامەزراو و چەسپاو دادەنێت و.. وا تێدەگات کە: فەرمانبەریی ژیانی بریتی‌یە لەوەی بەهۆی هاندەری خۆشەویستیی خۆیەوە، سەربکەوێت و گەشە بکات و خۆی پێبگەیەنێت بۆ ئەو خۆویستی‌یەی خۆی.

بەم جۆرە، ئەوان ڕێبازەکەیان بە چەندین بناغەی زۆری بێ کەڵك ڕاگیر کردووە و، لەسەر ئەم بناغە فشەڵ و لاوازانە بنیاتیان ناوە. لە زۆر پەیامدا بە تایبەت لە "وتەکان"دا و، زیاتر لە "وتەی دوازدەهەم" و "وتەی بیست و پێنجەم"دا کە تایبەتە بە موعجیزاتی قورئانەوە، بە چەشنێکی گومانبڕ مەودای بێ کەڵکیی ئەو بناغانەمان چەسپاندووە.

گەورە پیاوان و زیرەکان و پێشەوایانی فەلسەفە، وەك: ئەفلاتوون و، ئەرستۆ و، ئیبن سینا و، فارابی، لە ئەنجامی پشت بەستنیان بەم بناغە لاواز و بێ‌کەڵکانەوە، لەو باوەڕەدا بوون کە ئامانجی هەرە بەرزی کامڵیی گرۆی مرۆڤ لەوەدایە کە: "لە خوا بچن"!

بەم چەشنە فەرمانێکی ناڕەوای فیرعەونانەیان دەرکرد و ڕێیان بۆ زۆر لەو دەستە و تاقمانە ئاسان کرد کە چەندین جۆری هاوەڵ بڕیاردان لە هەڵسوکەوتیاندا دەبینرێت، وەك: هۆپەرستان و، بتپەرستان و، سروشتپەرستان و، ئەستێرەپەرستان. ئەمەشیان لە ڕێی وورووژاندنی "منێتی"ی مرۆڤەوە ئەنجامداوە، تاکو بێ هیچ بەربەستێك لە شیو و دۆڵەکانی شیرك و گومڕایی‌دا بێت و بڕوات. ئیتر بەم کارەیان ئەو ڕێگایەیان لە مرۆڤ گرت کە

دەیگەیەنێتە بەندایەتیی خوای گەورە و، دەرگاکانی: کۆڵەواری و، لاوازی و، پێویستی و، کەموکووڕی و ناتەواوی‌یان لێ داخست کە لە سروشتی مرۆڤدا هەن. بەم جۆرە لە لیتاوی "سروشت"دا چەقین و ون بوون و، نە بە تەواوی لە چلکاوی شیرك ڕزگاریان بوو، نە دەرگای فراوان و هەمیشە لەسەرپشتی شوکرانەبژێریشیان دۆزی‌یەوە!

بەڵام بڕیار و فەرمانی ئەوانەی کە لە ڕێڕەوی "پێغەمبەرێتی"دان لەم ڕووەوە، بڕیارێکە یەکپارچە "بەندایەتیی بێ گەردە" بۆ تەنها خواوەندی مەزن. لەو بڕیار و فەرمانەیاندا ئەوەیان ڕاگەیاندووە کە: مەبەستی هەرە بڵند و فەرمانبەریی سەرەکیی مرۆڤ لەوەدایە کە: "بە خوو و ڕەوشتە خوایی‌یەکان ڕەفتار بکەن و لە خۆیاندا بیانهێننەدی". واتە: ئەو ڕەوشت و هەڵسوکەوتە بەرز و جوانانەی کە خواوەند داوایان دەکات و مایەی ڕەزامەندیی ئەون جێبەجێیان بکەن.. هەروەها لەوەدایە کە مرۆڤ کۆڵەواریی خۆی بزانێت تا هانا بۆ لای توانا و هێزی خوای گەورە ببات و.. چاوی لە هەژاریی خۆیەوە بێت، تاکو بۆ لای میهرەبانیی ئەو خوایە بگەڕێتەوە و.. تەماشای دەستکورتیی خۆی بکات تاکو لە دەوڵەمەندیی خواوەند بەهرەمەند ببێت و.. کەمتەرخەمی‌یەکانی خۆی بزانێت بۆ ئەوەی داوای لێبوردن لە پەروەردگاری بکات و.. بە شوێن ناتەواوی‌یەکانی خۆی‌دا بگەڕێت، تاکو تەقدیس و تەسبیحاتی خوا بکات و خواوەند لە بیروباوەڕی خۆی‌دا پاك و خاوێن ڕابگرێت.

جا لەبەر ئەوەی فەلسەفەی سەرپێچی کار لە ئایین بەو جۆرە ڕێی ون کرد و لە ڕێی ڕاست دوورکەوتەوە، ئەوا سەرەنجام "من" لە ڕێڕەوی فەلسەفەدا جڵەوی خۆی بە دەستەوە گرت و، بە پەلە و زوویی خۆی هاویشتە باوەشی هەموو جۆرێکی گومڕایی‌یەوە.

بەم چەشنە، لەسەر لوتکەی ئەم ڕووەی "من"ەوە، درەختێکی زەققوومی ئەوتۆ ڕوا کە گومڕایی‌یەکەی نیوەی گرۆی مرۆڤی گرتەوە و لە ڕێی ڕاست دووری خستنەوە.

ئەو بەروبوومانەی کە ئەو درەختە زەققوومە چەپەڵە خستوونیەتە بەرچاوی مرۆڤ لە لقی "هێزی ئارەزووە ئاژەڵی‌یەکان"دا بریتین لە: بتەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە. چونکە فەلسەفە هەر لە سەرەتادا "هێز"ی بەلاوە شتێکی باشە و دەیکات بە یاسایەکی بڕیاردراوی ڕێبازەکەی، بە ڕادەیەك کە ئەو یاسا و بنەمایەی کردووە بە یەکێك لە یاساکانی خۆی کە دەڵێت: (فەرمانڕەوایی بۆ ئەو کەسەیە سەربکەوێت) و لەسەر ئەو بنەمایەش دەڕوات کە دەڵێت: (حەق لە هێزدایە)[1] ئیتر بە چەشنێکی ناوەکی و پەنهان و نادیار ستەم و دەستدرێژی

(١) بەڵام بڕیاری ڕێڕەوی پێغەمبەرێتی لەم بارەیەوە ئەوەیە کە دەڵێت: "هێز لە حەقدایە، نەك حەق لە هێزدا" بەمەش ڕێگا لە ستەم دەگرێت و ڕیشەکەنی دەکات و، دادگەری دەهێنێتەدی. (دانەر)

کردنی پێ خۆشه و، هانی ستەمکار و کەللەڕەق و سەرکەشانی دا تا گەیاندنیە ئەوەی لافی خوایەتی لێبدەن!

پاشان جوانی و شێوەکانی جوانیی بوونەوەرانی بە هی خودی ئەو بوونەوەرانە لە قەڵەم داوە. بەم کارەشی ئەوەی لە بیری خۆی بردووەتەوە کە ڕێژەی ئەو جوانی‌یە لە چاو درەوشانەوەی جوانیی پاك و خاوێنی بەدیهێنەر و داهێنەری خاوەنی جوانی‌دا هەرگیز بەراورد ناکرێت. دەبینیت لە بریی ئەوەی بڵێت: (بەدیهێنانی ئەمە چەندە جوانە)! دەڵێت: (ئەمە چەندە جوانە)! واتە ئەو جوانی‌یەی وەك بتێکی پەرستراو لێ کردووە!

پاشان فەلسەفە و درەختە چەپەڵەکەی، جوانیی ڕواڵەتیی دیاردەکانی ناوبانگ دەرکردن و ڕیاکاری‌یان بەلاوە شتێکی جوانە. لەبەر ئەوە هەمیشە ڕیاکارانی هان داوە و پاڵی پێوە ناون تاکو پتر لەسەر هەڵە و نەفامیی خۆیان سوور بن و، وای لە بتەکان و هاوچەشنی بتەکانیش کردووە کە ئەوانیش پەرستیارانی خۆیان بپەرستن[1].

ئەم درەختە چەپەڵە لە لقی "هێزی تووڕەیی و زەبروزەنگ"دا فیرعەون و نەمروود و ستەمکارە بچووك و گەورەکانی بەسەر تەوقی سەری مرۆڤەوە گۆش کردووە و پێی گەیاندوون..

لە لقی "هێزی ژیری"یشدا سروشت پەرست و ماددی‌یان و بەروبوومی چەپەڵی تری هاوچەشنی ئەوانی لە ژیریی مرۆڤدا داناوە، بەم کارەشی ژیریی مرۆڤی بە تەواوی پەرتەوازە و تەفروتوونا کردووە.

پاشان.. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستی‌یە، وا لە نێوان هەزاران بەراورددا، بە چەند نموونەیەك، بەراوردێکی نێوانی ئەو بەرهەمانە دەکەین کە لەو بناغە فشەڵ و بێ کەڵکانەی فەلسەفەوە پەیدا بوون و، ئەو ئەنجامانەش کە لە بناغە ڕاستەکانی ڕێڕەوی پێغەمبەرێتی‌یەوە سەریان هەڵداوە:

☐ **نموونەی یەکەم:**

یەکێك لە دەستوورەکانی ڕێڕەوی پێغەمبەرێتی لە ژیانی خۆیی مرۆڤدا ئەوەیە کە (گرۆی مرۆڤ بە ڕەوشتە جوانەکانی خوا ڕەفتار بکەن). واتە بە گرۆی مرۆڤ دەڵێت: خەڵکینە! ببن بە بەندەی پاك و بێ گەردی خوای گەورە و بەو ڕەوشتانەی مایەی ڕەزامەندیی ئەون ڕەفتار بکەن و، هانا تەنها بۆ لای ئەو ببەن و، لە ناخی دەروونتاندا دان بە کۆڵەواری و هەژاری و ناتەواوی‌یەکانتاندا بنێن.

---

(١) واتە: ئەو لەبت چووانە، چەند هەڵسوکەوتێکیان لێ دەردەکەوێت کە لە هی پەرستن دەچن، تاکو ئەوانەی پێیان موعجەبن ڕوویان تێ بکەن و شوێنیان بکەون و، بەم پێیە و لەم ڕێیەوە ئارەزووەکانی دەروونی خۆیان بهێننەدی. کەواتە ئەوانە لە ڕوویەکەوە پەرستکارن و، لە ڕوویەکی تریشەوە پەرستراون! (دانەر)

جا ئەم دەستووورە مەزنە، لە کوێ و.. ئەو وتەیەی فەلسەفەش لە کوێ کە دەڵێت: "تشبهوا بالواجب" واتە: "لە خوا بچن"! کە ئەمەش بە ئامانجی هەرەبەرزی مرۆڤایەتیی دادەنێن؟!

ئایا چییەتیی مرۆڤ کە بە: کۆڵەواری و، هەژاری و، لاوازی و، پێویستیی لەسنووربەدەر شێلراوە، لە کوێ و.. چییەتیی "واجب الوجود"یش کە خواوەندی بەتوانای بەهێزی دەوڵەمەند و مەزنە، لە کوێ؟!

**❑ نموونەی دووهەم:**

یەکێك لە دەستووورە چەسپاوەکانی ڕێڕەوی پێغەمبەریتی لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا ئەوەیە کە: "یارمەتیدانی یەکتر" دەستووری زاڵ و دەستەڵاتداری ناو گەردوونە، هەر لە مانگ و خۆرەوە هەتا دەگاتە ڕووەك و ئاژەڵ. دەبینیت ڕووەك بەدەم پێویستیی ئاژەڵەوە دەڕوات و، ئاژەڵیش بە هانای مرۆڤەوە دێت. بەڵکو گەردیلەکانی خۆراکیش بەدەم خواستی خانەکانی لەشی مرۆڤەوە دەڕۆن و یارمەتی‌یان دەدەن.

جا ئەم دەستووورە بەنرخەی "یارمەتیدان" و یاسای ڕێزلێنانە خوایی‌یە، لە کوێ و.. دەستووری "مشتومڕ"یش لە کوێ، کە فەلسەفە لای وایە دەستووری زاڵ و فەرمانڕەوای ژیانی کۆمەڵایەتی‌یە؟ دەبێت بیشزانین کە "مشتومڕ" تەنها لای هەندێك لە ستەمکاران و ئاژەڵە دڕندەکان و لە ئەنجامی بەکارهێنانی هەڵە و خراپی سروشتی خۆیانەوە سەری هەڵداوە. تەنانەت فەلسەفە لەم گومڕایی‌یەدا پتر ڕۆچووە و ئەم دەستووری "مشتومڕ"ەی کردووە بە دەمڕاست و فەرمانڕەوای زاڵی ناو هەموو بوونەوەران! ئەوەتا بە تەواوی پێی لێ ڕادەکێشێت و بەوپەڕی نەفامی و گەلحۆیی‌یەوە وا بڕیار دەدات کە گوایا: "ژیان تێکڕا بریتی‌یە لە مشتومڕ و ململانێ"!

**❑ نموونەی سێهەم:**

یەکێك لە بەرهەمە بەنرخەکانی ڕێڕەوی پێغەمبەریتی و دەستووورە بەرزەکانی لە یەکتاناسیی خوا(التوحید)دا ئەوەیە کە ڕایگەیاندووە: (یەك تەنها لە یەکەوە دەردەچێت) واتە: هەر شتێك خاوەنی یەکێتی بێت ئەوا لە دەستی یەك کەسەوە دەرچووە. چونکە مادەم هەرچی شت هەیە یەکێتی‌یەکی ئاشکرای هەیە، ئەوا دەبێت هەموو بەدیهێنانی یەك کەس بن.

بەڵام دەستوور و باوەڕی فەلسەفەی کۆن لەسەر ئەوەیە کە: (یەك، تەنها یەکی لێ پەیدا دەبێت). واتە: یەك زات تەنها یەك شتی لێ دەردەکەوێت و بەدیی دەهێنێت، ئنجا شتانی تر بە بۆنەی هۆکارەکانەوە سەرهەڵدەدەن.

وەك ئاشكرايە، ئەم دەستوورەی فەلسەفەی كۆن جۆرە هاوبەشی‌یەك لـە پـەروەردگاريتيی خوادا بـە هۆكارەكـان دەبەخشيت و، ئـەو خوايـەی كـە لـە ڕاستی‌دا توانـای بەسـەر هـەموو شتێكدا هەيە و دەوڵەمەندی ڕەهايە و پێويستی بە هيچ شتێك نی‌يە، ئەو فەلسەفەيە وای پيشـان دەدات كە گوايا پێويستی بە چەند هۆكارێكی دەستەوسان و كۆڵەوار هەيە! تەنانەت لـەوەش زيـاتر لـەناو گومڕايـی‌دا ڕۆچـوون و لـە ڕێ لايـان دا و دووركەوتنـەوە، چونكـە نـاوێكی بەديهێنراويان لـە خواوەنـدی بەديهێنـەر نـا، كـە بريتی‌يـە لـە: "ژيريی يەكـەم"! ئنجـا موڵكـی خوايان بەسەر هۆكارەكاندا دابەش كرد و، بەم كارەش ڕێيان بۆ شيركێكی مەزن والاّ كرد.

جا ئايا ئەو دەستووری "يەكتاناسی"يەی ڕێڕەوی پێغەمبەريتی، لە كوێ و.. ئەم دەستوورە بە شيرك و گومڕايی چەپەڵ بووەی فەلسەفەی نەخۆشی كۆنيش، لە كوێ؟

لە كاتێكدا فەيلەسووفە ئيشراقی‌يەكان كە لە هەموو ئەوانی تر تێگەيشتووترن، وتەی ئـاوا نەشياويان لە زار دەربچێت، دەبێت فەيلەسووفە ماددی و سروشتی‌يەكان، كە پلەيان لـە هـی ئەوان گەلـێ نزمترە، چی بڵێن؟!

□ **نموونەی چوارەم:**

يەكێك لە دەستوورە سەرتاپا دانستەكانی ڕێڕەوی پێغەمبەريتی ئەوەيە كە: (هـەموو شـتێك حيكمەت و سوودی تابلێی زۆری تێدايە) بە ڕادەيەك كە، وەك لە ئايەتی: ﴿**وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ**﴾يەوە دەردەكەوێت، درەخـت بـە ئـەندازەی ژمـارەی ئـەو بەرانـەی دەيـانگرێت دانستی تێدايـە. خـۆ ئەگـەر لـە بەديـهێنانی زيندەوەرێكـدا تەنـها يـەك دانسـت بـۆ خـودی ئـەو زينـدەوەرە بڕواتـەوە و ڕووی لـە "بـوون"ی ئـەو بێـت، ئـەوا هـەزاران ئـەنجام و دانـايی لـە بەديهێنانی ئەودا هەن كە هەموو ڕوويان لە بەديهێنەری دانا و مەزنی ئەو زيندەوەرەيە و بۆ ئـەو بەديهێنەرە دەگەڕێنەوە.

بەڵام دەستووری فەلسەفە لەم ڕووەوە ئەوەيە كە:

(حيكمـەت و سـوود لـە بەديـهاتنی هـەموو زيندەوەرێكـدا هـەر ڕووی لـە خـودی زيندەوەرەكەيـە و تەنـها بـۆ قـازانج و بـەرژەوەندیی ئـەو دەگەڕێتـەوە يـاخود پـەيوەنديی بـە بەرژەوەنديی مرۆڤەوە هەيە).

ئـەم دەستوورە، چـەندين حيكمـەتی زۆر لەبـەر بوونـەوەر دادەمـاڵێت كـە پێـی دراوە و، بەرێكی بچووكی وەك تـۆوە خەرتەلەيـەك بـە درەختێكـی گـەورەی زەبەلاح دەسـپێرێت. بـەم كارەش "بوون"ی بوونەوەران دەكات بـە بێ‌مەبەستی‌يەكی وا كـە هيـچ كـەڵك و سـوودێكی تێدا ناهێڵێتەوە.

جا ئایا ئه‌و داناییی‌یه ڕاسته، له كوێ و.. ئه‌م ده‌ستووره فشه‌ڵ و بێ كه‌ڵكه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی له دانایی به‌تاڵ، له كوێ، كه تێكڕای بوونه‌وه‌ران به "بێ‌مه‌به‌ستی" بۆیه ده‌كات؟!

لێره‌دا ته‌نها ئه‌م ئه‌ندازه‌یه‌مان نووسی، چونكه ئه‌م حه‌قیقه‌ته‌مان له "ڕاستیی ده‌هه‌می وته‌ی ده‌هه‌م - په‌یامی حه‌شر"دا زیاتر به درێژی ڕوون كردووه‌ته‌وه.

ئنجا دوای ئه‌م به‌راوردكردنانه، تۆ بۆ خۆت ده‌توانیت له ڕوانگه‌ی ئه‌م چوار نموونانه‌ی باسمان كردن هه‌زاران نموونه‌ی تر بهێنیت و به هه‌مان پێوه‌ر لێكیان بده‌یته‌وه. ئێمه له په‌یامی "چه‌ند بریسكانه‌وه‌یه‌ك"دا ئاماژه‌مان بۆ هه‌ندێكیان كردووه.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی فه‌لسه‌فه پشت به‌م جۆره بناغه فشه‌ڵ و لاواز و ناساغانه ده‌به‌ستێت و، له‌به‌ر ئه‌نجامه بێ كه‌ڵكه‌كانیشی، ئه‌وا فه‌یله‌سووفه هه‌ره زیره‌ك و بلیمه‌ته‌كانی ئیسلام، وه‌ك: "ئیبن سینا" و "فارابی" كه زرق و برقی ڕواڵه‌تیی فه‌لسه‌فه له خشته‌ی بردن و، ڕێی فه‌لسه‌فه‌یان گرته‌به‌ر، ئه‌مانه، نزمترین پله‌ی ئیمان نه‌بێت زیاتریان ده‌ست نه‌كه‌وت، كه پله‌ی ئیمانداری ئاسایی‌یه. ته‌نانه‌ت ئیمامی غه‌زالی ئه‌و پله‌یه‌شی بێ ڕه‌وا نه‌بینیون!

هه‌روه‌ها پێشه‌وایانی "موعته‌زیله"ش كه زانا هه‌ره شاره‌زاكانی زانستی "كه‌لام"ن، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به ڕووی ئارایشتدراوی فه‌لسه‌فه خه‌ڵه‌تان و په‌یوه‌ندی‌یان له‌گه‌ڵدا پته‌وكرد و ژیری‌یان كرد به سه‌ركار و ده‌مڕاستی خۆیان، ئه‌وا جگه له پله‌ی "ئیمانداری فاسقی خاوه‌ن بیدعه‌ت" زیاتریان ده‌ست نه‌كه‌وت!

هه‌روه‌ها "ئه‌بولعه‌لای مه‌عه‌ڕڕی" كه یه‌كێكه له كه‌ڵه ئه‌دیبه موسڵمانه‌كان و به ڕه‌شبینی ناسراوه و.. "عومه‌ری خه‌ییام"یش كه به شین و گریانی هه‌تیوانه ناوبانگی ده‌ركردووه، ئه‌مان و جگه له‌مانیش له‌و ئه‌دیبه مه‌زنانه‌ی كه فه‌لسه‌فه سه‌رنجی ڕاكێشابوون و، ده‌روونی به‌دخوازیان له به‌رامبه‌ر فه‌لسه‌فه‌وه نوقمی سه‌رسامی و حه‌په‌سان بووبوون، هه‌موو ئه‌وانه، له لایه‌ن ئه‌هلی حه‌قیقه‌ت و كه‌ماڵه‌وه زلله‌ی: ته‌مێ كردن و، سووكی و، به كافر له قه‌ڵه‌م دانیان چه‌شت و پێیان وتن: (نه‌فامینه! ئێوه خه‌ریكی بێ‌ئه‌ده‌بی و كاری نه‌فامین و، ڕێی زه‌ندیقیتان گرتووه‌ته به‌ر و، له باوه‌شی ئه‌ده‌به‌كه‌تاندا زه‌ندیقان گۆش ده‌كه‌ن و پێیان ده‌گه‌یه‌نن)!

پاشان یه‌كێك له ئه‌نجامی بنچینه بێ كه‌ڵكه‌كانی فه‌لسه‌فه ئه‌وه‌یه كه: له كاتێكدا "من" چییه‌تی‌یه‌كی لاوازی وه‌ك هه‌وا و هه‌ڵم زیاتر هیچی تر نی‌یه، كه‌چی به‌هۆی ته‌ماشا كردنی شوومی فه‌لسه‌فه و به بۆنه‌ی ڕوانینی ئیسمیی بۆ شتان، ده‌توێته‌وه و، پاشان به‌هۆی ڕاهاتن له‌گه‌ڵی‌دا و ڕۆچوون له شتی ماددی و ئاره‌زوودا وه‌ك بڵێی ڕه‌ق ده‌بێت، ئنجا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بێ‌ئاگایی و ئینكاریی دێته‌ڕێ، ئه‌وا ئه‌و "منێتی"یه وه‌ك سه‌هۆڵ ده‌یبه‌ستێت، پاشان به بۆنه‌ی

سەرپێچی کردنی "من" لە فەرمانەکانی خواوەند، ئەوا وردە وردە ڕوونی‌یەکەی نامێنێت و لێڵ دەبێت، ئنجا بەرە بەرە ئەستوور دەبێت تا خاوەنەکەی قووت دەدات. تەنانەت "من" بەم ئەندازەیەش ڕازی نابێت، بەڵکو بەهۆی "بیرەکان"ی مرۆڤەوە دەئاوسێت و فراوان دەبێت و قیاسی خەڵکی و هۆکارەکان دەکاتە سەر خۆی، هەرچەندەش لە ناخەوە بە فیرعەونایەتیی ئەوانە ڕازی نابێت، کەچی فیرعەونایەتی‌یەکی ستەمکارانە بە هەموو یەکێك لەوانە دەبەخشێت! دیارە ئەو کاتەش وەك نەیارێکی فەرمانەکانی خوای گەورە دەردەکەوێت، وەك بڵێی ئەو خواوەندەی کە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانا و دەستەڵاتدارە، ئەم تۆمەتباری دەکات و سنگی لێ دەردەپەڕێنێت و دەڵێت:

﴿...مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ﴾؟ (يس:٧٨).

ئنجا لەسەر ئەم کارەی بەردەوام دەبێت تا وای لێ دێت دەست بخاتە ناو وەسفە مەزنەکانی خوای گەورەوە و، هەر شتێك لەگەڵ ئارەزووی ئەودا نەگونجێ، یان فیرعەونایەتیی دەروونی ئەو نەیەوێت، ئەوا بیگۆڕێت یان ئینکاریی بکات یان وەری نەگرێت.

بۆ نموونە: تاقمێك لە فەیلەسووفەکان ناوی: "الموجب بالذات"یان لە خوای گەورە ناوە، واتە: "خۆ بەسەر خۆدا سەپێن"! بەمەش ویست و ئیختیاریان لە خوای گەورە سەندووەتەوە و، شایەتیی هەموو گەردوونیان لەسەر ویستی سەربەستی خوا بە درۆ خستووەتەوە.

دەسا بڕوانە ئەم مرۆڤە چەندە سەیرە! خۆ هەموو بوونەوەران، هەر لە گەردیلەکانەوە هەتا دەگاتە خۆرەکان، بە جۆرێکی ڕوون و بە دەستنیشانکراویی شکڵ و شێوەیان و بە ڕێکوپێکی و دانایی و هاوسەنگی‌یان، بەڵگەن لەسەر ویستی بەدیهێنەری دانا. ئایا چۆن چاوی فەلسەفە هەموو ئەمانە نابینێت، خوا چاویان کوێر بکات؟!

تاقمێکی تری فەیلەسووفەکان لایان وابووە گوایا: (زانیاریی خوا بایەخ بە شتە هەندەکی‌یەکان نادات). بەمەش "نەفی"ی ئەوەیان کردووە کە زانیاریی خوای گەورە دەورەی بە هەموو شتێکدا داوە و هەموو شتێکی گرتووەتەوە و، شایەتی ڕاستی هەموو بوونەوەرانیان لەسەر ئەو زانیاری‌یە بەهەموو شت ئاگا و گشتگیرەی خواوەند وەرنەگرتووە.

پاشان فەلسەفە کاریگەری بە هۆکارەکان دەدات و، داهێنان و دروستکردن بە سروشت دەبەخشێت و، ئەو بەڵگانە نابینێت کە بەسەر هەموو بوونەوەرێکەوە دەبریسکێنەوە و شایەتن لەسەر بەدیهێنەری مەزن، وەك لە "وتەی بیست و دووهەم"دا چەسپاندوومانە. سەرەڕای ئەوەی کە بەدیهێنانی هەندێ بوونەوەران، کە چەند نووسراوێکی ناوازەی خواوەندن، بۆ سروشتی کۆڵەواری بێ گیان و هەست و شعوور دەگێڕێتەوە، کە جگە لە ڕێکەوت و هێزی

کتوکوێر زیاتر هیچی تری لە دەستدا نییە. بەم جۆرە سروشت دەکات بە سەرچاوەی بەدیهێنانی شتان و، کاریگەریی پێ دەبەخشێت و، بەم پێیە فەلسەفە هەزاران دانایی دەشارێتەوە کە لە دووتوێی بوونەوەراندان.

پاش ئەمانە، ئەوەش هەیە کە: فەلسەفە ڕێی فراوانی دوارۆژی نەدۆزیوەتەوە و پەیی پێ نەبردووە، بەم هۆیەشەوە ئینکاریی حەشری کردووە و، لای وابووە "گیان" ئەزەلییە، لە کاتێکدا کە دەزانین: خواوەند خۆی و هەموو ناوە پیرۆزەکانی و، گەردوون بە هەموو ڕاستییەکانیەوە و، پێغەمبەرە بەڕێزەکان بە هەموو ئەو ڕاستییانەی لەگەڵ خۆیاندا هێناویانن و، پەڕاوە ئاسمانییەکان بە هەموو ئایەتەکانیانەوە.. هەموو ئەمانە، حەشری دوارۆژ ڕوون دەکەنەوە، وەك لە "وتەی دەهەم"دا چەسپاندوومانە.

بۆ خۆت دەتوانیت بەم شێوەیە هەموو مەسەلە و کێشەکانی تری فەلسەفە بۆ سەر ئەم ئەفسانە بێ نرخانە قیاس بکەیت و بە هەمان پێوەر بیانپێویت و بە هەمان چاویش تەماشایان بکەیت.

بەڵێ، وەکو بڵێی شەیتانەکان بە دەنووك و نینۆکی "من" ژیریی فەیلەسووفانیان فڕاندووە و فڕێیان داونەتە ناو چاڵ و شیوی گومڕایی و، بەم چەشنە ژیریی ئەوانی هەپروون هەپروون کردووە!

کەواتە: "من" لە جیهانی بچووکدا -کە مرۆڤە- وەك "سروشت" وایە لە جیهانی گەورەدا؛ هەردووکیان "تاغووت"ن: ﴿فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ باللهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقى﴾ (البقرة:٢٥٦)!

* * *

هەشت ساڵ پێش دەستکردن بە دانانی ئەم پەیامە، لە ئەستەمبووڵ و لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا ڕووداوێکی میسالیم دی. ئەو کاتە من هێشتا "سەعیدی کۆن" و سەرقاڵی فەلسەفە بووم و لەوەدا بووم بگۆڕێم بە "سەعیدی نوێ". لەو کاتەدا سەرنجم لەو سێ ڕێبازەی کۆتایی سوورەتی "فاتیحە" دا کە بە: ﴿أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِم وَلا الضَّالِّينَ﴾ ئاماژەیان بۆ کراوە. لەم سەرنجدانەوە، ئەو ڕووداوە ئەندێشەییەم دی کە زۆر لە "خەون" دەچوو و، کاتی خۆی لە کتێبی "چەند بریسکانەوەیەك"دا و لە شێوەی گەشتێکی ئەندێشەییدا و بە پەخشانێکی لەشیعرچوو تۆمارم کرد. وا ئێستا کاتی ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی هاتووە، چونکە تیشکی ڕووناکی دەخاتە سەر ئەو ڕاستییە ناوبراوە:

خۆمم لە ناوەڕاستی دەشتایی‌یەکی گەلێ گەورە و فراواندا بینی‌یەوە و، هەوری تاریك و ڕەش ڕووی ئاسمانی داپۆشیبوو و، هەموو شوێنێکی سەر زەوی تەنگەنەفەسیی تێدا زاڵ بوو و بە ئاسانی هەناسە نەدەدرا و وەخت بوو مرۆڤی تێدا بخنکێت. نە سروەیەك هەبوو، نە ڕووناکی‌یەك، نە ئاوێك.. وام گومان دەبرد کە سەرزەوی لە دڕندە و ئاژەڵی زیانبەخش پڕ بووە..

لەو کاتەدا ئەوەم بە دڵدا هات کە ڕووەکەی تری زەوی سروەیەکی فێنك و ئاوێکی سازگار و ڕووناکی‌یەکی گەلێ جوانی لێ‌یە. کەواتە چار نی‌یە دەبێت بڕۆم بۆ ئەو لایەی کە ئەمانەی تێدان.. پاشان خۆم وا بینی‌یەوە کە بە ویستی خۆم بۆ ئەوێ دەڕۆم.. ڕۆشتمە ناو ئەشکەوتێکەوە لەناو زەوی‌دا کە لە تونێلی ناو چیاکان دەچوو، ڕێم گرتەبەر و ڕۆشتم، دەمبینی پێش من کەسانی زۆری تر بەم ڕێگایەی ژێر زەوی‌دا گوزەریان کردووە و بێ ئەوەی ڕۆشتنەکەیان تەواو بکەن، لە پەلوپۆ کەوتوون و لە جێی خۆیاندا هەناسەیان سوار بووە و خنکاون، چونکە جێ پێ‌یانم دەبینی و جار بە جاریش دەنگی هەندێکیانم دەهاتە گوێ، بەڵام هێندەی نەدەخایاند ئەو دەنگەش دەبڕا و کپ دەبوو.

دەسا ئەی ئەو هاوڕێ‌یەی کە ئەویش بە ئەندێشەی خۆی لەم گەشتە ئەندێشەیی‌یەدا بەشداریم دەکات!

ئەو زەوی‌یە: "سروشت" و "فەلسەفەی سروشتی‌یە".. تونێلەکەش: ئەو ڕێبازەیە کە ڕێڕەوانی فەلسەفە بۆ مەبەستی گەیشتن بە "ڕاستی" بە بیری خۆیان بڕیویانە.. جێ پێ کانیش جێ پێی فەیلەسووفە بەناوبانگەکانی وەك: "ئەفلاتوون" و "ئەرستۆ"ن..[(١)] ئەو دەنگانەش کە دەهاتنە گوێم: هی بلیمەت و مرۆڤە زیرەکەکانی چەشنی "ئیبن سینا" و "فارابی" بوون. بەڵێ، هەندێ "وتە" و "یاسا"ی "ئیبن سینا"م لە هەندێ جێ‌دا دەبیست، بەڵام بە تەواوی ئەو دەنگانە دەبچڕان و نەدەمان و نەیاندەتوانی پتر بەرەو پێش بڕۆن، واتە: دەخنکان!

---

(١) ئەگەر دەڵێیت: جا تۆ چییت تاکو زۆران لەگەڵ ئەو مرۆڤە بەناوبانگانەدا بگریت؟ ئایا وەك مێشێکیش دەبیت تاکو لەگەڵ ئەو هەڵۆیانەدا بفریت؟

منیش دەڵێم: مادەم مامۆستایەکی ئەزەلیم هەیە کە قورئانی پیرۆزە، ئەوا لە ڕێی گەیشتندا بە "ڕاستی و زانست" بە ئەندازەی باڵە مێشێکیش خۆم بە ناچار نازانم بایەخ بەو هەڵۆیانە بدەم کە قوتابیی ئەو فەلسەفەیەن بە گومڕایی چەپەڵ بووە و، شوێنکەوتەی ئەو ژیری‌یەن کە دووچاری دەردی گومانە.. کەواتە هەرچەندە پلەم لەوانە نزمتر بێت، بەڵام مامۆستاکانی ئەوان بە چەندین پلەی لەژمارەبەدەر لە خوارووی مامۆستاکەی منەوەن. بە سایەی مامۆستاکەمەوە، ئەو ماددەیەی کە ئەوانی بە تەواوی لە خۆی‌دا نوقم کرد، نەیتوانی بنی پێیشم تەڕ بکات! بەڵێ، سەربازێك کە فەرمانی پادشایەکی مەزنی پێ بێت، دەتوانێت کاری وا ئەنجام بدات کە "موشیرێك" لای پادشایەکی بچووك هەرگیز نەتوانێت ئەنجامی بدات. (دانەر)

بە هەر حاڵ، وا من هەندێ لەو ڕاستییانەم بۆ ڕوون كردیتەوە كە لە ژێر پەردەی ئەندێشەكەمدان، تاكو هەندێ تاسەمەندیی چاوەڕوانی كردنت لەسەر شان سووك بكەم.. وا ئێستاش بۆ باسی گەشتە ئەندێشەییەكەم دەگەڕێمەوە:

كاتێ من لە ڕۆشتندا بەردەوام بووم، كتوپڕ دوو شتم هاتنە دەست:

یەكەمیان: گڵۆپێكی كارەبایی بوو كە تاریكیی چڕ و ئەستووری ژێر زەویی دەڕەواندەوە.

دووهەمیان: ئامێرێكی مەزن بوو، بەردی گەورە گەورەی وەك چیاكانی لەتوپەت دەكرد و ڕێی بۆ دەكردمەوە. لەو كاتەدا ئەوەم بە گوێدا درا كە: ئەم چرا و ئامێرەت لە گەنجینەی قورئانی پیرۆزەوە پێ بەخشراوە.

بەم چەشنە، ماوەیەك ڕۆشتم تاكو گەیشتمە دیوەكەی تر. دەبینم لەوێ، لە ئاسمانێكی سافی بێ هەوری ساماڵ و جواندا خۆر هەڵهاتووە و، ڕۆژیش بەهارێكی خۆشی سەفا بەخشە و، سروەی هەوایش وەك گیانی بە بەردا كرابێت هەڵی دەكرد و، ئاوی سازگاریش لە كانیاوەكانەوە بە خوڕ دەهاتە خوارێ.. بە كورتی: جیهانێكم دی كە بە خۆشی و شادی و كامەرانی خەملابوو. منیش سوپاس و شوكرانەی زۆرم پێشكەشی خوای گەورەی خۆم كرد.

پاشان سەیری خۆمم كرد، دەبینم خاوەنی خۆم نیم و ناتوانم بەسەر دەروون و خودی خۆمدا زاڵ و سەركەوتوو بم و، یەكێك هەیە تاقیم دەكاتەوە..

كتوپڕ جارێكی تر خۆم لەو دەشتاییە بەرینەدا بینییەوە و، دیسان هەوری ڕەشی تاریك ڕووی ئاسمانی داپۆشی و دنیا تاریك داهات و لە تەنگەنەفەسیدا وەخت بوو هەناسەم بۆ نەدرێت. وام هەست دەكرد كە یەكێك هەیە بۆ ڕێیەكی ترم دەبات، چونكە بینیم ئەم جارەیان لەسەر ڕووی زەوی بۆ لاكەی تر دەڕۆم نەك لە ناو تونێلەكەوە. لەم ڕۆشتنەی ئەم جارەمدا شتی گەلێ سەیر و دیمەنی سامناكی زۆر ناوازەم دی كە هەرگیز باس ناكرێن، چونكە دەمبینی دەریا ڕقی لێم هەڵساوە و زریان دەیترساندم و هەموو شتێك تەگەرەی دەهێنایە ڕێم، بەڵام ئەو تەگەرە و قورساییانەم بە سایەی ئەو هۆی گەشتەی كە لە قورئانی پیرۆزەوە پێم بەخشرابوو، لەسەر ڕێ بۆ لا دەبرا و كارم بۆ ئاسان دەكرا.. بەردەوام هەنگاوم دەنا و ڕێم دەبڕی و تەرمی گەشتیارانم لەم لا و لەو لای ڕێگادا دەبینی كە یەك لە هەزاری گەشتیاران نەبێ كەسی تر ئەو گەشتەیان تەواو نەكردبوو! هەرچۆن بوو لە تاریكیی ئەو چەرە هەورانەی كە وەخت بوو مرۆڤ بخنكێنن، ڕزگارم بوو و گەیشتمە لاكەی تری زەوی و، ڕووبەڕووی خۆری ڕاستەقینە بوومەوە و هەناسەیەكی فێنك و خۆشی ئاسوودەم

هەڵکێشا و، دەستم بە گەشت و گەڕان کرد لەو جیهانەدا کە وەك بەهەشت وابوو و، سوپاسی خوای گەورەم کرد و وتم: "الحمد لله".

پاشان دەبینم نایەڵن لێرەشدا بمێنمەوە، چونکە یەکێك هەیە دەیەوێت ڕێیەکی ترم پیشان بدات. لەبەر ئەوە، یەکسەر بردمیەوە دۆخی یەکەم جار بۆ دەشتاییەیە بەرینەکەی یەکەم. سەیرم کرد چەندین شتی چەشنی پلیکانەی کارەبایی لە بەرزایی ئاسمانەوە دادەبەزنە خوارەوە و هەریەکەیان شێوە و جۆریان لەوانی تر جیاوازە، هەندێکیان لە فڕۆکە دەچوون و هەندێکی تریان لە ئۆتۆمبیل و هەندێکی تریش وەك زەمبیلە شۆڕ کرابوونەوە.. ئنجا هەرکەسێك بەپێی هێز و توانای خۆی بتوانێت دەست بە یەکێك لەمانەوە بگرێت ئەوا سەردەخرێت و لەوێ ڕزگاری دەبێت. منیش سواری یەکێکیان بووم، دەبینم لە ماوەی یەك خولەکدا لە سەرووی هەور و لەسەر چەندین چیای سەوز و جوان و ڕەنگیندام، تەنانەت ئەو چیایانە ئەوەندە بەرزن کە هەورەکان ناگەنە نیوەیان و، لە هەموو جێگایەکەوە جوانترین ڕووناکی و ناسکترین سروە و سازگارترین ئاو دەبینران و هەستیان پێ دەکرا. کە بە جوانی تەماشای هەموو لایەکم کرد، دەبینم ئەو مەنزڵگا نوورانی‌یانەی کە وەك پلیکانە وان، لە هەموو شوێنێکدا هەن. لە دوو گەشتەکەی ترم لە ڕووەکەی تری زەوی‌دا شتی وەك ئەمانەم دەبینی، بەڵام هیچم لە بارەیانەوە نەدەزانی، وا ئێستا تێ‌دەگەم کە ئەو مەنزڵگایانە هی درەوشانەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزن. جا:

*ڕێی یەکەم*: هی گومڕایانە، کە بە: ﴿**وَلَا الضَّالِّينَ**﴾ ئاماژەیان بۆ کراوە و، ڕێبازی ئەوانەیە کە بەرەو چەمکی "سروشت" ێ‌یان خلیسکاوە و بیری سروشتی‌یەکانیان هەڵگرتووە. دیارە ئێوەش هەستتان کرد و بۆتان دەرکەوت کە گەیشتن بە "ڕاستی" بەهۆی بڕینی ئەم ڕێگایەوە چەندە کارێکی دژوار و پڕ لە گیروگرفتە.

*ڕێی دووهەمیش*: کە بە: ﴿**غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ**﴾ ئاماژەی بۆ کراوە، ڕێبازی هۆپەرستانە و هی ئەوانەیە کە "بەدیهێنان" دەگێڕنەوە بۆ هۆکارەکان و کاریگەری‌یان دەدەنێ و، دەیانەوێت وەك دانایانی فەلسەفەی گەڕۆکایەتی(الحكماء المشائيون) تەنها لە ڕێی "بیر" و "ژیری"یەوە بگەن بە ڕاستیی هەموو ڕاستی‌یەکان و ناسینی خوای گەورە.

*بەڵام ڕێی سێ‌هەم*: کە بە: ﴿**أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ**﴾ ئاماژەی بۆ کراوە، ڕێی ڕاست و نوورانیی شوێنکەوتووانی قورئانە و، کورتترین و بێ‌مەترسی‌ترین و ئاسانترین ڕێ‌یە و، لە بەردەم هەموو خەڵکی‌دا کراوەتەوە تاکو بیگرنە بەر و، ڕێگایەکی ئاسمانی و ڕەحمانی و نوورانی‌یە!

# مەبەستی دووهەم

## "لە بارەی ئاڵوگۆڕی گەردیلەکانەوە دەدوێت"

**ئەم مەبەستە ئاماژە بۆ تەنها گەردیلەیەك لە گەنجینەی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکات:**

بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿وقالَ الَّذينَ كَفَرُوا لا تَأْتِينا السَّاعَةُ قُلْ بَلى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَالِمُ الْغَيْبِ لا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ في السَّموات ولا في الأَرْضِ ولا أَصْغَرَ مِنْ ذلِكَ وَلا أَكْبَرَ الاّ في كِتَابٍ مُبِينٍ﴾** (سبأ:٣)

**(ئەم مەبەستە بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە گەنجینە مەزنەکەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوون دەکاتەوە. واتە لەو گەوهەرە دەدوێت کە لە سندووقە هەرە بچووکەکەی گەردیلەدا هەیە و، بەشێکی گەلێ کەم لە جموجووڵ و فەرمانبەرییەکانی گەردیلە لە "سێ خاڵ" و "پێشەکی"یەکدا باس دەکات).**

## پێشەکی

جموجووڵ و هاتوچۆی گەردیلەکان لە ڕاستیدا بریتییە لە:

هاتوچۆ و لەرینەوەیان کاتێك کە قەڵەمی توانستی خواوەند ئایەتە تەکوینییەکانی گەردوون دەنووسێت. کەواتە بەو جۆرە نییە کە ماددی و سروشتییەکان گومان دەبەن گوایا: هاتوچۆی ئەو گەردیلانە یاریی ڕێکەوتە کە بە جووڵاندنێکی کوێرانە و بێ واتا و ناوەڕۆك دەیانجووڵێنێت و یارییان پێ دەکات.. نەخێر وا نییە! چونکە هەرچی گەردیلە هەن هەر هەموویان لە سەرەتای جموجووڵیاندا وەکو هەموو بوونەوەرانی تر "بسم الله" دەکەن و ناوی خوای گەورە دەبەن، بەوەدا کە چەندین کۆڵی قورسی تابڵێی زۆر کە لە توانای خۆیان گەلێ زیاتر بێت هەڵدەگرن، وەك تۆوی درەختی کاژ کە درەختە مەزنەکەی خۆی هەڵدەگرێت. ئنجا کاتێ فەرمانبەری و کاری خۆیان تەواو دەکەن دەڵێن: "الحمد لله". چونکە ئاسەوار و شوێنەوارێکی جوان و ناوازەیان دەرخست. وەك بڵێی ئەو گەردیلەیە

قەسیدەیەکی جوانی لە ستایشی بەدیهێنەری مەزنیدا هۆنیبێتەوە، بەهۆی ئەو جوانی‌یە ڕێکوپێك و سەرانسەر دانستەی و، بە بۆنەی ئەو شێوە نایابەی کە واتا و ناوەرۆکێکی قووڵی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە ژیرانی تێدا سەرسام و سەرسووڕماو دەبن.

ئەگەر دەتەوێت ئەمەت بە جوانی بۆ ڕوون ببێتەوە، ئەوا فەرموو بە وردی تەماشای هەنار و گەنمەشامی بکە.

بەڵێ، ئەو ئاڵوگۆڕ و هاتوچۆیەی گەردیلەکان، چەند جموجووڵ و لەرینەوەیەکی پڕ لە واتای قووڵن و، هی ئەو نووسین و کوژاندنەوانەن کە قەڵەمی توانستی خواوەند لە تابلۆی: کوژانەوە و نووسین(لوحة المحو والإثبات)دا دەیاننووسێت و دەیانکوژێنێتەوە، ئەو تابلۆیەی کە ڕاستیی "کات"ی بەخورەمی هاتوچۆکەر و، لاپەڕەی میسالیی کات دەنوێنێت و لەبەر "الکتاب المبین"دا نووسراوە و گیراوەتەوە، کە ئەویش ناونیشانی توانست و ویستی خواوەندە و، تەوەرەی هەڵسوکەوتیەتی لە بەدیهێنانی شتان و پێکهاتنیان لە جیهانی بینراو و کاتی ئێستادا، بەپێی دەستوورەکانی: "الإمام المبین" کە ئەویش هەرچی تایبەتکاریی بنەچە و لقی شتان هەیە، واتە: بنەچەی هەموو شتێك کە بەسەرچووە و نەوەکانی داهاتووشی تێدا کۆبوونەتەوە، کە هەموو ئەمانەش لەگەڵ گشت تایبەتکاری‌یەکانیاندا جیهانی پەنهانی "غەیب" لەگەڵ خۆیدا پێچاونیەتەوە. "ئیمامی موبین" جگە لەوەی کە باسمان کرد، لە هەمان کاتیش‌دا نیشانەی فەرمان و زانیاریی خواوەندە[1].

---

(١) لە چەند جێیەکی قورئاندا ﴿إمام مبین﴾ و ﴿کتاب مبین﴾ هەن. هەندێ لە تەفسیرنووسان وتوویانە: هەردووکیان یەك واتایان هەیە. هەندێکی تریش وتوویانە: واتاکانیان لە یەك جیایە و، چەند ڕوویەکی جیاجیا و جۆراوجۆریان بۆ ڕاستیی واتاکانیان لێك داوەتەوە. کورتەی قسەکانیان لەوە دەرناچێت کە وتوویانە: ئەم دوانە دوو ناونیشانی جیای زانیاریی خواوەندن.

بەڵام من، بەهۆی ڕێژنەی نووری قورئانی پیرۆزەوە، دڵنیایی تەواوم بۆ پەیدا بوو کە: "ئیمامی موبین" ناونیشانی جۆرێکە لە "زانست" و "فەرمانەکانی" خواوەند کە زیاتر ڕوویان لە جیهانی پەنهانی غەیبە تاکو جیهانی بینراو. واتە: زیاتر بۆ ڕابوردوو و داهاتوو دەڕوانن تاکو کاتی ئێستا. بە دەستەواژەیەکی تر دەڵێین: تۆمارێکی قەدەری خوای گەورەیە کە زیاتر بۆ بنەچە و نەوە و ڕەگ و تۆوی هەموو شتێك دەڕوانێت تاکو بوونە ڕواڵەتی‌یەکەی. لە وتەی بیست‌وشەشەم (پەیامی قەدەر) و لە پەراوێزی وتەی دەهەم(پەیامی حەشر)دا بوونی ئەم تۆمارە چەسپێنراوە.

بەڵێ، ئەم "ئیمامی موبین"ە ناونیشانی جۆرێکی "زانست" و "فەرمانی" خوای گەورەیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە: بەرهەمهێنانی بنەما و ڕەگ و بنەچەی شتان بەوپەڕی ناوازەیی و وردەکاری و داهێنانەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم ڕێکوپێکی‌یە بەپێی تۆماری دەستوورەکانی "زانست"ی خواوەند ئەنجام دەدرێن.. هەروەها ئەنجام و نەوە و تۆوی شتان، لەبەر ئەوەی بەرنامە و پێڕستی بوونەوەرانی داهاتوویان تێدایە، ئەوا تۆمارێکی بچووکی "فەرمانەکانی" خواوەندن. بۆ نموونە: دەتوانرێت بوترێت: "تۆو" بەرنامە و پێڕستێکی بەرجەستەیە بۆ هەموو پێکهێنەرەکانی درەختی زەبەلاح و بۆ ئەو "فەرمانە تەکوینی‌یانە"ی خواوەند کە ئەو بەرنامە و پلان و پێڕستانە دەستنیشانیان دەکەن.

# خاڵی یەکەم

## بریتی‌یە لە دوو باس

بە کورتی: "ئیمامی موبین" وەك پێڕست و بەرنامەیەك وایە بۆ "درەختی بەدیهێنراوان" کە بە چواردەوری ڕابوردوو و ئایندە و جیهانی پەنهانی "غەیب"دا ڕەگ و لق و پەلیان هاویشتووە. کەواتە: "ئیمامی موبین" بەم واتایە: تۆماری قەدەر و دەفتەری دەستوورەکانی خواوەندە و، کاتێ گەردیلەکان بەرەو جموجووڵ و کار و فەرمانبەری‌یان لەناو شتاندا دەدرێنەبەر، ئەوا بەپێی داخوازی و فەرمانەکانی ئەو دەستوورانە بەرەو ئەو مەبەست و ئامانجانە دەبرێن.

بەڵام "کیتابی موبین" زیاتر ڕووی لە جیهانی بینراوە تاکو جیهانی پەنهان. واتە: زیاتر ڕووەو کاتی ئێستا دەڕوانێت تاکو ڕابوردوو و ئایندە. چونکە زیاتر ناونیشان و تۆماری کتێبی "توانست و ویست"ی خواوەندە تاکو ئەوەی ناونیشانی زانست و فەرمانەکانی خوای گەورە بێت. بە دەستەواژەیەکی تر دەڵێین: هەروەك "ئیمامی موبین" تۆماری "قەدەر"ی خواوەندە، "کیتابی موبین"یش تۆماری "قودرەت"ی ئەوە. واتە: ڕێکوپێکی و وردەکاری کە لە هەموو شتێکدا هەن، چ لە "بوون"ی‌دا، چ لە چی‌یەتی‌یەکەی‌دا، چ لە سیفەتەکانی‌دا، چ لە کاروباری‌دا، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە کاتێ ئەو شتە بوونی پێ دەبەخشرێت و وێنەکانی بۆ دەستنیشان دەکرێت و، ئەندازەی بۆ دیاری دەکرێت و، شێوەیەکی تایبەتیی پێ دەدرێت، هەموو ئەمانەی بەپێی چەند دەستوورێکی توانستێکی تەواو و یاساکانی ویستێکی جێبەجێ‌کراو، بۆ ئەنجام دەدرێت.

کەواتە ئەو "توانست و ویستەی خواوەند" دارای چەندین یاسای هەمەکی و گشتین و، ئەم یاسایانەش لە تۆمارێکی مەزندا هەڵگیراون و پارێزراون، بە چەشنێك کە بەرگ و پۆشاکی جۆرەکانی "بوون"ی هەموو شتێك و وێنە و شێوە تایبەتی‌یەکانی، بەپێی ئەو یاسایانە دەبڕرێن و دەدووررێن. بوونی ئەم تۆمارە و بوونی "ئیمامی موبین" لە پەیامی "قەدەری خوا و جوزئی ئیختیاری"دا چەسپێنراون.

سەیری نەفامی و گومڕایی و بێ‌ئاگایی فەیلەسووفەکان بکە.. ئەوەتا ئەوان هەستیان بە بوونی لەوحی پارێزراوی توانستی بەدیهێنەرانەی خواوەند کردووە و، بە دیاردەکانی ئەو کتێبە بینەرەی دانایی پەروەدگار و ویستە جێبەجێ‌کراوەکەی ئەویان لە شتاندا زانیوە و، پەی‌یان بە وێنە و نموونەکانی بردووە.. بەڵام - بە داخەوە - ناوی "سروشت"یان لێ ناوە و، بەمەش ڕووناکی‌یەکەیان کوژاندووەتەوە!

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە: بە داخوازیی "ئیمامی موبین" واتە: بەپێی فەرمانی "قەدەر"ی خوای گەورە و دەستوورە جێبەجێ کراوەکانی ئەو، توانست(قودرەت)ی خواوەند کاتێ شتان دروست دەکات، ئەوا زنجیرەی بوونەوەران دەنووسێت کە هەریەکەیان لە خۆی‌دا نیشانەیەکی سەربەخۆیە و، گەردیلەکان لە "لەوحی کوژانەوە و تۆمارکردن"دا - کە لاپەڕەی میسالیی "کات"ە - بەدی دەهێنێت و دەیانبزوێنێت.

واتە: جموجووڵ و بزووتنی گەردیلەکان، لە ڕاستی‌دا، بریتین لە چەند لەرینەوە و بزووتنەوەیەك کە دێنە ڕێی بوونەوەران کاتێ لە "نووسین" و "لەبەرگرتنەوە" و "جیهانی پەنهان"ەوە بەرەو جیهانی بینراو دێن و دەپەڕێنەوە. واتە کاتێ لە: "زانست"ەوە بۆ "توانست" دەڕۆن و دەگوێزرێنەوە.

"تابلۆی کوژاندنەوە و تیانووسین"یش لە ڕاستی‌دا تۆمارێکی بگۆڕی تابلۆی پارێزراو(اللوح المحفوظ)ی مەزن و هەمیشەیی و چەسپاوە و، تابلۆیەکە لە بازنەی "مومکینات"دا شتانی تێدا دەنووسرێن و دەکوژێنرێنەوە. واتە: تۆمارێکە بۆ ئەو شتانەی کە هەردەم مردن و ژیان و نەمان و بوونیان لە ڕێ‌دایە، بە چەشنێ کە ڕاستیی "کات" بریتی‌یە لەم تۆمارە. بەڵێ، هەرچی شت هەیە دارای ڕاستی‌یەکە، ڕاستیی ئەو شتەش کە ئێمە ناوی "کات"مان لێ ناوە و وەك ڕووبارێکی مەزن و بەخوڕ وایە بە گەردووندا دەڕوات، کاغەز و مەرەکەبی نووسینەکانی توانستی خواوەندە لەو "لەوحی کوژاندنەوە و تۆمارکردن"ەدا! "لایعلمُ الغیبَ إلا اللهُ". (دانەر)

## باسی یەکەم

لە بزووتن و وەستانی هەموو گەردیلەیەکدا، دوو نـووری یەکتاناسـی پرشنگ دەدەن کە وەك دوو خۆری درەخشان وان.

بە کورتی لە ئاماژەی یەکەمی وتەی دەهەم و، بە درێژیش لە وتەی بیست و دووهەمدا، بـە چەشنێکی دڵنیایی‌بەخش چەسپاندوومانە کە:

ئەگەر هەرچی گەردیلـە هـەن، فەرمانبـەرداری فەرمانـەکانی خواوەنـد نـەبن و، بـە کـار و ڕوخسەتی ئەو نەبزوێن و، ئاڵوگۆڕەکانیان بەپێی زانسـت و توانسـتی ئـەو نـەبێت، ئـەوا دەبـێ هەموو گەردیلەیەك دارای زانستێکی بێ سنوور و بیناییەکی ئەوتۆ بێت کـە هـەموو شـتێکی پێ ببینێـت و، خـاوەنی ڕوویـەك بێـت کـە تەماشـای هـەموو شـتێکی پێ‌بکـات و، فـەرمانی لـە هەموو شتێکدا جێ‌بەجێ کراو بێت!

چونکە هەموو یەکێك لە گەردیلەی توخـمەکان، لـەناو جەسـتەی هـەموو زیندەوەرێکـدا کـارێکی ڕێکوپێـك ئـەنجام دەدات یـان دەتوانێـت ئـەنجامی بـدات. لـە کـاتێکدا کـە دەزانـین ڕێسای شتان و یاساکانی پێکـهاتنیان وەك یـەك نـین و پێچەوانـەی یـەکترین و، ناگونجێ هیـچ کارێك ئەنجام بدرێت گەر ڕێساکانی نـەزانرێن، تەنانـەت ئەگـەر گەردیلـە کـارێك بـۆ خـۆی ئەنجام بدات، ئەوا هەرگیز لە هەڵە بەدەر نابێت. بەڵام خۆ ئـەوەتا دەبینـین هـەموو کـارێك بـێ هیچ هەڵەیەك ئەنجام دەدرێن. کەواتە یان ئەوەیە ئـەو گەردیلانـە بـەپێی فـەرمان و ڕوخسـەت و زانست و ویستی کەسێك کار دەکەن کە بە هەموو شتێك زانـا و ئاگـادارە.. یـان دەبـێ ئەو گەردیلەیە خۆی خاوەنی ئەو زانستە فراوان و توانستە ڕەهایە بێت!

پاشـان هـەموو یـەکێك لـە گەردیلـەکانی "هـەوا" دەتوانێـت بڕواتـە نـاو لەشـی هـەموو زیندەوەرێك و هەموو بەر و گوڵێك و بنیاتنانی هەموو گەڵایەکەوە و، لەناو هەریـەك لەوانـەدا کاری خـۆی جێ‌بـەجێ بکـات، کە دەشـزانین بنیاتنـان و ڕێسـای هەریـەك لەمانـە لـەوانی تـر گەلـێ جیـاوازە، بۆ نموونـە گـەر کارگـەی بـەری هـەنجیر لـە کارگـەی چنـین بچێـت، ئـەوا کارگەی بەری هەنار وەك کارگەی شەکر دەبێت. کەواتە نەخشە و بینای هەریەکەیان لەوی تر جیاوازە، لەگەڵ ئەوەشدا هەریەك لەم گەردیلانەی "هەوا" دەڕواتە (یان دەتوانێـت بڕواتـە) ناو هەریەك لەمانەوە و بە کارامەییەکی لەڕادەبەدەر و داناییەکی تەواو کـاری خـۆی تێـدا ڕادەپەڕێنێت و چەند بـارودۆخێکی دیـاری کـراوی تێـدا وەردەگرێـت، پاشـانیش کـە کـاری خۆی ئەنجام دا و فەرمانبەرییەکەی لەوێدا تەواو کرد، یەکسەر بەجێی دەهێڵێت و دەڕوات بە ڕێی خۆیەوە.

ئه‌م گه‌ردیله بزێوه‌ی كه له‌ناو "هه‌وا"ی بزۆكدایه، یان ئه‌وه‌یه هه‌موو ئه‌و وێنانه ده‌زانێت كه كراونه‌ته به‌ر ڕووه‌ك و زینده‌وه‌ران و گوڵ و به‌روبوومه‌كان و، ئاگاداری ئه‌ندازه و چه‌شنی نه‌خشه‌ی یه‌ك به یه‌كیانه! یاخود ئه‌و گه‌ردیله‌یه فه‌رمانبه‌رداری فه‌رمانی یه‌كێكه كه هه‌موو ئه‌مانه ده‌زانێت و به‌پێی ویستی ئه‌و كاره‌كانی ڕاده‌په‌ڕێنێت!

هه‌روه‌ها هه‌موو گه‌ردیله‌یه‌كی بێ‌ده‌نگ و سه‌نگی ناو "خاك و خۆڵ"ی مه‌نگ و وه‌ستاوی زه‌وی، ئاماده‌یه بۆ ئه‌وه‌ی كه هه‌رچی تۆوی ڕووه‌ك و دره‌خته‌كان هه‌ن تیای‌دا بڕوێنرێن، چونكه ئه‌گه‌ر ئه‌و تۆوانه بخرێنه ناو مشتێك گڵه‌وه (كه له چه‌ندین گه‌ردیله‌ی ئه‌وه‌نده له‌یه‌كچوو پێكهاتووه، ده‌ڵێی یه‌ك گه‌ردیله‌ن) و، له‌گه‌ڵ گه‌ردیله‌كانی ئه‌و گڵه‌دا به‌ر یه‌ك بكه‌ون، ئه‌وا ده‌ڕوێن و سه‌وز ده‌بن.. جا یان ئه‌وه‌یه:

هه‌ریه‌ك له‌م تۆوانه كارگه‌یه‌كی ته‌واوی له‌گه‌ڵ گشت پێداویستی‌یه‌كانی ئه‌و كارگه‌یه له‌و گڵه‌دا بۆ ئاماده كراوه، واته: یان ئه‌وه‌یه له‌و مشته گڵه‌دا به ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی هه‌موو ڕووه‌ك و دره‌خت و به‌روبوومه‌كان كارگه‌ی مه‌عنه‌ویی ورد و زۆر و زه‌به‌نده هه‌ن.. یان له‌و مشته گڵه‌دا زانست و توانستێكی فراوان و گشتی ببێت كه هه‌موو شتێك له "عه‌ده‌م"ه‌وه به‌دی بهێنێت..

یان ئه‌و كردارانه به هێز و توانستی ئه‌و خواوه‌نده ئه‌نجام ده‌درێن كه به‌سه‌ر هه‌موو شتاندا به‌توانایه و زانای هه‌موو شتێكه!

گریمان كه‌سێك كه هیچ شتێك له باره‌ی هۆكاره‌كانی شارستانێتی نه‌زانێت و سه‌رباری ئه‌م نه‌زانینه‌ش كوێر و نابینا بێت، بچێت بۆ ئه‌وروپا و له‌وێ بڕواته ناو هه‌موو كارگه‌كان و چه‌ندین كاری داهێنانكاری و بێ وێنه و ناوازه له هه‌موو چه‌شنه‌كانی پیشه‌سازی و جۆره‌كانی بینادا به ڕێكوپێكی‌یه‌كی ته‌واو و دانایی‌یه‌كی له‌ڕاده‌به‌ده‌ر و لێزانی‌یه‌كی كارامانه له‌ناو ئه‌و كارگانه‌دا ئه‌نجام بدات، به چه‌شنێك ژیریی مرۆڤیان تێدا سه‌رسام ببێت..

بێ گومان ئه‌و كه‌سه‌ی خاوه‌نی تۆزێك هه‌ست بێت، دڵنیایه له‌وه‌ی كه ئه‌و مرۆڤه نه‌شاره‌زا و كوێر و نه‌زانه، له خۆیه‌وه ئه‌و كارانه ناكات، به‌ڵكو مامۆستایه‌كی زانای هه‌یه ئه‌وانه‌ی فێر ده‌كات و ئه‌و كارانه‌ی پێ ئه‌نجام ده‌دات.

هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر مرۆڤێكی كۆڵه‌واری كوێری په‌ك‌كه‌وته‌ی ئیفلیج له كۆڵێتێكی بچووكدا دانیشتبێت و له جێی خۆی نه‌بزوێت و هیچ كارێكی پێ نه‌كرێت، ئنجا هه‌ندێ چه‌و له‌گه‌ڵ چه‌ند پارچه‌یه‌ك ئێسك و كه‌مێ لۆكه‌ی بۆ ببرێته ژووره‌وه و، كتوپڕ چه‌نده‌ها ته‌ن(طـن) شه‌كر و، چه‌ندین تۆپ پارچه‌ی چنراو و، هه‌زاران دانه گه‌وهه‌ر و مرواری و، چه‌ندین به‌رگ و پۆشاكی نایابی له باشترین جۆر و له‌وپه‌ڕی ڕازاوه‌یی و، چه‌نده‌ها خوارده‌مه‌نیی

تابلێی بەتام و لەزەت لە کۆڵیتەکەیەوە هاتە دەرەوە.. ئایا تەنانەت ئەو کەسەش کە هەر تەنها خاوەنی کەمێك ژیری بێت ناڵێت: ئەم مرۆڤە کوێرە پەككەوتەیە تەنها خزمەتگوزار و پاسەوانێکی لاوازی ئەو کارگە نائاسایی‌یە بێ وێنەیەیە و لای خاوەنی ئەو کارگەیە - کە دارای چەندین کاری لەعادەت بەدەرە - خزمەت دەکات؟!

جموجوولی گەردیلەکانی "هەوا" و کار و فەرمانبەری‌یان لە ڕووەك و درەخت و گوڵ و بەروبوومەکاندا، بە هەمان جۆرە.. چونکە هەریەك لەو ڕووەك و درەخت و گوڵ و بەروبوومانە، نووسراوی صەمەدانیی خواوەندن و، یەکێکن لە شاکارەکانی سنعەتی پەروەردگار و، موعجیزەیەکی توانستی خوای گەورە و کارێکی دەراسای دانایی ئەون. کەواتە هاتوچۆی ئەو گەردیلانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، تەنها بە فەرمانی بەدیهێنەرێکی دانای شکۆمەند و، ویستی داهێنەرێکی دەست ڕەنگین و خاوەن جوانی دەبێت.

قیاسی گەردیلەکانی "گڵ"یش لەسەر گەردیلەکانی "هەوا" بکە، ئەوەتا گەردیلەکانی "گڵ" ڕواندنگەی هەموو گوڵەگەنم و تۆو و ناوکێکن و، هەریەکەیان وەك مەکینەیەکی سەیر و چاپخانە و گەنجینەیەکی لە یەکتر جیاواز وان و، هەریەکەیان تابلۆیەکن ناوە جوانە لە یەك جیاوازەکانی خواوەند ڕادەگەیەنن و، پارچە قەسیدەیەکی ناوازەن، بە باڵای کەماڵی خواوەندا دەخوێنن.. گومانیش لەوەدا نی‌یە کە ئەو تۆوە بێ وێنانە بە فەرمانی ئەو خواوەندە مەزنە بوون بە ڕەگ و بنج و بناغەی ئەو درەخت و ڕووەکانە، کە دارای فەرمانی: "کن فیکون"ە و، هەموو شتێك گوێڕایەڵی فەرمانی ئەوە و، بە ڕوخسەت و بەپێی ویست و هێزی ئەو خواوەندە نەبێت کار ناکەن. ئەمەش دڵنیایی‌یەکی بێ‌گومان و چەسپاوە و، ئێمەش باوەڕمان پێیەتی.

## باسی دووەم

ئەم باسە ئاماژەیەکی ئاسان دەکات، بۆ ئەو دانایی و فەرمانبەری‌یانەی کە لە جموجوولی گەردیلەکاندا هەن.

ماددی‌یەکان، کە ژیری‌یان دابەزیوەتە چاویان و جگە لە ماددە چیی تر نابینن، بەپێی دانایی‌یە بۆش و بەتاڵ و، فەلسەفە بنیات نراوەکەیان لەسەر بناغەی "بێ‌مەبەستی" لە بوونەوەردا، لایان وایە کە:

ئاڵوگۆڕی گەردیلەكان پەیوەستە بە "ڕێكەوت"ەوە. ئەمەشیان بە ڕادەیەكی وا بەلاوە گرنگە كە كردوویانە بە بناغەی هەموو دەستوورەكانیان و سەرچاوەی دروستكردنی هەموو بەدیهێنراوانی پەروەردگار!

ئەو كەسەی خاوەنی ئەوەندەی گەردیلەیەك ژیری بێت، بە دڵنیاییەوە دەزانێت كە ئەو ماددییانە چەندە لە ڕوانگەی بیركردنەوەی ژیرانەوە دوورن، كاتێ ئەم بەدیهێنراوانەی كە بە چەندین دانایی زۆر و زەبەندە ڕازێنراونەتەوە، دەدەنە دەست شتێكی تێكەڵوپێكەڵی كتوكوێری ئەوتۆ كە نە هیچ واتایەكی هەیە و نە دارای هیچ دانستێكە!

بەڵام ڕوانگە و دانایی قورئان – لەم ڕووەوە – ئەوەیە كە:

ئاڵوگۆڕ و جموجوولی گەردیلەكان چەندین دانایی تابڵێی زۆر و، ئامانج و فەرمانبەریی لەژمارەبەدەری هەیە. كە ئەم ئایەتە پیرۆزە و هاوچەشنی لە ئایەتە زۆرەكانی قورئان، ئاماژەیان بۆ دەكەن:

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ (الإسراء:٤٤).

وا ئێمە لێرەدا – بۆ نموونە – ئاماژە بۆ تەنها چەند دانەیەكیان دەكەین:

❑ **یەكەمیان:**

خوای گەورە بۆ مەبەستی نوێكردنەوەی درەوشانەوەكانی خۆی لە بەدیهێنانی شتانی ناو گەردووندا، هەردەم گەردیلەكان دەبزوێنێت و بە توانستی خۆی دەیانخاتە كار و، هەموو "گیان"ێك دەكات بە (مۆدێل)ێكی ئەوتۆ كە هەموو ساڵێك جەستەیەكی نوێی لە موعجیزاتی توانستی خۆی دەكاتە بەر و، بە دانایی خۆی لە یەكبەیەكی هەموو كتێبێك هەزاران كتێبی جۆراوجۆر ڕوونووس (فۆتۆكۆپی) دەكات و، تاكە یەك "ڕاستی" لە چەندین جۆر و وێنەی جیاجیادا دەردەخات و، دەرفەت و جێ بۆ هاتنی چەندین "بوون" و جیهان و بوونەوەرانی نوێ دەسازێنێت كە دەستە لە دوای دەستە دێنە جیهانی "بوون".

❑ **دووهەمیان:**

خواوەندی شكۆمەندی خاوەنی مولكی گەردوون، ئەم دنیایەی بە تایبەت ئەم زەوییەی لە شیوەی كیلگەیەكی فراواندا بەدی هیناوە. واتە: بۆ ئەوە ئامادەی كردووە كە توانای نەش و نما و گەشە پێكردنی بەروبوومی بوونەوەرانی ببیت و، بتوانیت ئەم بەروبوومانە بە تەری و پاراوای و تازەیی دەربخات. واتە: تاكو موعجیزە بێ كۆتاییەكانی توانستی خۆی تیدا بروینیت و پاشان درووینەیان بكات.

لەم كیلگە مەزن و بەرینەیدا، كە بە ئەندازەی رووی زەوی فراوانە، خواوەند لە هەموو سەردەم و، وەرز و، مانگ و، رۆژێك، تەنانەت لە هەموو سەعاتیكدا، لە موعجیزاتی

توانستی خۆی، بوونەوەرانی نوێ دەخاتە ڕوو و، بەروبوومی نوێ بە گۆڕەپان و سەرخەرمانی ڕووی زەوی دەبەخشێت. ئەمەش بەوەی کە ئەو خواوەندە مەزنە بەپێی دانایییەکی تەواو و ڕێکوپێکییەکی ورد گەردیلەکان دەبزوێنێت و دەیانخاتە کار. خواوەندی گەورە، بەم جموجوولانەی گەردیلەکان، دیارییەکانی میهرەبانی و نموونەکانی توانستی خۆیمان بۆ دەردەخات، کە هەرگیز تەواو نابن و لە کۆتایی نایەن.

**❑ سێهەمیان:**

خوای گەورە بە دانایییەکی تەواو، گەردیلەکان دەجوولێنێت و لە چەندین فەرمانبەریی ڕێکوپێکدا بەکاریان دەهێنێت، لە پێناوی ئەوەی داهێنانە بێ وێنەکانی خۆی لە بوونەوەراندا دەربخات، تاکو ناوە جوانەکانی خوای گەورە واتای درەوشانەوە لەبن نەهاتووەکانیان ڕابگەیەنن. ئەوەتا خواوەند لە یەك شوێنی بچووکی دیاری کراودا ئەو وێنە داهێنراوە لەژمارەبەدەرانە دەردەهێنێت کە بەڵگەن لەسەر ئەو درەوشانەوە بێسنوورانە و.. لە یەك لاپەڕەی تەسکدا چەندین ئایەتی تەکوینیی لەژمارەبەدەر دەنووسێت کە چەندین دانایی بەرزی بێسنوور دەردەبڕن.

بەڵێ، بەروبووم و ئەنجامەکانی بوونەوەرانی ساڵی پێشوو، هەروەها بەروبووم و ئەنجامەکانی ئەمساڵ، هەردووکیان لە ڕووی چییەتییانەوە وەك یەك وان، بەڵام واتا و ناوەرۆکەکانیان تابڵێی جیاوازن، چونکە بەپێی گۆڕانی دەستنیشانکارییە گوێرەیییەکان(التعينات الإعتباريـــــة) واتا و ناوەرۆکەکانی ئەو بەروبووم و ئەنجامانە لە زیادبووندا دەبن، هەرچەندەش ئەو دەستنیشان کردنە گوێرەیی و کەسی و کاتییانە دەگۆڕرێن و بە ڕواڵەت لەناودەچن، بەڵام واتا جوانەکانیان هەر دەمێننەوە و بەردەوام دەبن.

کەواتە ئەگەر لە گۆشەی "ڕاستی"یەوە تەماشای گەڵا و گوڵ و بەروبوومەکانی بەهاری پێشووی ئەم درەختە بکەین، ئەوا دەبینین - لەبەر ئەوەی وەك مرۆڤ دارای "گیان" نین - هەمان گەڵا و گوڵ و بەروبوومن کە لەم بەهارەشدا هەن، جیاوازییان تەنها لەوەدایە کە دەستنیشان کردنی گوێرەیی ئەمانەی ئەمساڵ لەچاو ئەوانەی ساڵی پێشوودا جیایە.

جا ئەم دەستنیشانکارییە نوێیانەی ئەمساڵ بۆ ئەوە هاتوونەتە جێی ئەوانەی ساڵی پێشوو تاکو واتاکانی کاروباری ناوە جوانەکانی خواوەند - کە هەردەم درەوشانەوەیان لە تازەبوونەوەدایە - ڕابگەیەنن.

**❑ چوارەمیان:**

دانای شکۆمەند، لەم کێڵگە تەنگ و تەسکەی دنیادا گەردیلەکان دەبزوێنێت و لەم کارگەی چنینەی زەویشدا دەیانچنێت و، بەمەش وا لە بوونەوەران دەکات کە هەمیشە لە جموجووڵ و ڕۆشتندا بن، بۆ مەبەستی ئامادەکردنی: پێداویستی و، ئارایشت و، بەروبوومی

شیاو بۆ چه‌ندین جیهانی فراوانی بێ‌سنووری وه‌ك: جیهانی میسال و، جیهانی هه‌ره فراوانی مه‌له‌كووت و، جیهانه له ژماره به‌ده‌ره‌كانی تری دواڕۆژ. كه‌واته خواوه‌ند له‌م زه‌وی‌یه بچووكه‌دا چه‌ندین به‌روبووم و ئه‌نجامی مه‌عنه‌ویی تابلێی زۆر بۆ ئه‌و جیهانه مه‌زن و زۆر فراوانانه ئاماده ده‌كات و، له‌م دنیاوه لافاوێك هه‌ڵده‌كات كه كۆتایی نی‌یه و له گه‌نجینه‌ی توانسته ڕه‌هاكه‌ی خۆیه‌وه هه‌ڵی ده‌قوڵێنێت و ده‌یڕێژێته ناو جیهانی په‌نهانی "غه‌یب"ه‌وه و، به‌شێكی تریشی ده‌نێرێته ناو جیهانه‌كانی دواڕۆژه‌وه.

❑ **پێنجه‌میان:**

خوای گه‌وره، له‌م سه‌رزه‌وی‌یه ته‌سك و بچووكه‌دا و له ماوه و كاتێكی كه‌می كۆتایی پێ هاتوودا، به توانستی خۆی و، به‌پێی دانایی‌یه‌كی ته‌واو، گه‌ردیله‌كان ده‌بزوێنێت و له چه‌ندین ئیش و كاری ڕێكوپێكدا به‌كاریان ده‌هێنێت، بۆ مه‌به‌ستی:

ده‌رخستنی چه‌ند كه‌مالاتێكی بێ‌كۆتایی خواوه‌ند و..

دره‌وشانه‌وه‌ی جوانیی بێ‌سنووری خۆی و..

ده‌ركه‌وتنی: شكۆمه‌ندیی نه‌براوه و ته‌سبیحاتی له‌ژماره‌به‌ده‌ری په‌روه‌ردگاری‌یانه.

كه‌واته خواوه‌ند وا له بوونه‌وه‌ران ده‌كات كه چه‌نده‌ها ته‌سبیحاتی بێ‌كۆتایی له ماوه‌یه‌كی كۆتایی پێ‌هاتوو و شوێنێكی بچووكی كه‌مدا، ئه‌نجام بده‌ن. بۆ ئه‌وه‌ی دره‌وشانه‌وه‌كانی: جوانی و، ته‌واوی و، شكۆمه‌ندی‌یه ڕه‌هاكانی خۆی به‌وان ده‌ربخات و، هه‌ندێكی زۆریش له "ڕاستی"یه غه‌یبی‌یه‌كان و به‌روبوومه‌كانی دواڕۆژ و داهێنكاری‌یه ناوازه و میسالی‌یه‌كان - كه وێنه و پێناسه‌ری نه‌فه‌وتاو و ماوه‌ی شته نه‌ماوه‌كانن - و، زۆرێكی زۆریش له چنراوانی دانایی‌یانه‌ی خۆی، به‌پێی ئه‌وه‌ی كه له "له‌وحی پارێزراو"دا نووسراوه، به‌دی بهێنێت.

ئه‌و كه‌سه‌ی گه‌ردیله‌كان ده‌بزوێنێت و، ئه‌م هه‌موو ئامانجه مه‌زن و، دانایی‌یه گه‌ورانه ده‌رده‌خات، ته‌نها خوای گه‌وره‌ی تاكی ته‌نیایه. ده‌نا ده‌بێ هه‌موو گه‌ردیله‌یه‌ك "ژیری"یه‌كی مه‌زنی به ئه‌ندازه‌ی خۆری ببێت!

به‌م جۆره بۆمان ده‌ركه‌وت كه نموونه‌ی گه‌لێ زۆر هه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه ئاڵوگۆڕ و جموجوڵی گه‌ردیله‌كان به‌وپه‌ڕی دانایی ئه‌نجام ده‌درێت، وه‌ك ئه‌م پێنج نموونانه‌ی باسمان كردن. ته‌نانه‌ت له‌وانه‌یه پێنج هه‌زار نموونه زیاتریش بن.

به‌ڵام ئه‌و فه‌یله‌سووفه نه‌فامانه به گومانی خۆیان بزووتنی گه‌ردیله‌كانیان به بێ حیكمه‌ت داناوه! چونكه گومانیان وایه: هه‌ردوو بزووتنه‌كانی گه‌ردیله كه به‌وپه‌ڕی شه‌وق و تاسه‌مه‌ندی و جه‌زبه‌ی په‌روه‌ردگاری‌یانه ده‌بزوێن و یه‌كێكیان "ئاسۆیی"(آفـــاقي) و ئه‌وی

تریان "دەروونی"(أنفســي)یە و، بە چەشنی موریدی تەریقەتی مەولەوی هەمیشە لە تەسبیحات و یادی خواوەنددان.. ئەوان لەو گومانەدان کە گەردیلە لە خۆیەوە دەبزوێت و بە سەرسامی‌یەوە سووڕدەخوات و دەجوولێتەوە و، ئەم کارەشی هیچ ئامانج و مەبەستێکی تێدا نی‌یە!

**لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:** زانستی ئەو فەیلەسووفانە لە ڕاستی‌دا زانست نی‌یە، بەڵکو نەزانی‌یە و، دانستەکەشیان بێ‌مێشکی‌یەکی لە دانایی بەتاڵە!

(لە خاڵی سێ‌هەمدا حیکمەتێکی تر بە درێژی باس دەکەین، کە شەشەمە).

## خاڵی دووهەم

هەموو گەردیلەیەك دوو شایەتی ڕاستگۆی تێدایە لەسەر "بوون" و "یەکتایی" خوای گەورە.

بەڵێ، کە گەردیلە چەندین کاری تابلێی گەورە ئەنجام دەدات و، چەندەها کۆڵی زۆر قورسی لە وزەی خۆی زیاتر بەوپەڕی هەست و شعوورەوە هەڵدەگرێت، هەرچەندەش بۆ خۆی کۆڵەوار و بێ‌گیانە.. بەم کارەی، شایەتی‌یەکی بێ‌گومان لەسەر "بوون"ی خوای گەورە دەدات.

هەر ئەم گەردیلەیە شایەتی‌یەکی تری ڕاست لەسەر "یەکتایی" و "تەنیایی" خواوەندی خاوەنی جیهانی ئاشکرا و پەنهان دەدات ئەمەش، لە ڕێی ڕێکخستنی جموجوولەکانی و گونجاندیان لەگەڵ ئەو ڕێسا گشتی‌یەی کە لە گەردووندا کار دەکات و، چاودێری کردنی ڕێسا لە هەر جێ‌یەکدا کە تێی بچێت، خۆ کە دەشڕواتە ئەو جێ‌یە، ئەوا بە شارەزایی‌یەکی وا تیای‌دا نیشتەجێ دەبێت کە دەڵێی هەر لە بناغەدا جێی خۆی بووە!

واتە: ئەو کەسەی کە گەردیلە هی ئەوە، ڕێ و شوێنی هاتوچۆی گەردیلەکەش هەر هی ئەوە.

بە واتایەکی تر: لەبەر ئەوەی گەردیلە خۆی لە خۆی‌دا دەستەپاچە و بێ‌دەستەڵاتە و لە هەمان کاتیش‌دا کۆڵی سەرشانی تابلێی قورسە و ئەو کارانەش کە پێی سپێرراون لە ژمارە نایەن، ئەوا ئەم گەردیلەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەموو وەستان و بزووتنێکی تەنها بە فەرمان و بە ناوی خوایەکی خاوەن توانستی ڕەهایە و، خۆی خاوەنی هیچ توانا و دەستەڵاتێك نی‌یە.

پاشان ڕێکخستنی جموجوولی خۆی بە چەشنێك کە لەگەڵ ڕێسا گشتی و هەمەکی‌یەکانی گەردووندا بگونجێت و بە ڕادەیەك کە دەڵێی ئەو یاسایانە دەزانێت و ئاگای

لێیانە، ئنجا ڕۆشتنی بۆ ناو هەموو شوێنێك بێ ئەوەی هیچ شتێك ڕێی لێ بگرێت.. ئەمە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم کارانەی بەهۆی توانستی یەکێکەوە ئەنجام دەدات کە خاوەنی زانستێکی ڕەهایە و بەپێی دانستە فراوانەکەی ئەو جێبەجێیان دەکات.

بەڵێ، سەرباز پەیوەندیی لەگەڵ یەك بە یەکی پەل و، لق و، فەوج و، تیپ و، لەشکرەکەیدا هەیە و، لە هەریەکەیاندا بە گوێرەی ئەو پەیوەندییەی لەگەڵیدا هەیەتی، کاری تایبەتیی پێ سپێرراوە دەبێ ئەنجامی بدات. دیارە گونجاندن و ڕێکخستنی جموجووڵ و ئیشوکارەکانی لەگەڵ ئەم هەموو لایەنانەدا و، زانینی ئەم پەیوەندییانە و کارەکانی خۆی لە یەك بە یەکی فەرمانگەکاندا و، جێبەجێ کردنی داخوازییە سەربازییەکانی وەك: مەشق کردن و تەعلیمات وەرگرتن بەپێی ڕێساکانی سەربازی.. دیارە هەموو ئەم کارانە بەوە ئەنجام دەدرێن کە ئەو سەربازە گوێڕایەڵیی تەواوی بۆ فەرماندەی مەزنی گشتیی سوپا ببێت، کە پێشەوای هەموو ئەو فەرمانگە سەربازییانەیە و، بەوە دەبێت کە هەموو یاساکانی جێبەجێ بکات.

هەروەك پەیوەندییەکانی یەك تاکە سەرباز لەناو سەربازگەیەکدا بەم چەشنەیە..

هەموو گەردیلەیەکیش لەو گەردیلانەی کە دەڕۆنە ناو پێکهاتووە ئاڵۆزەکان، بارێکی لەبار و شیاو و جێیەکی گونجاوی خۆی لەناو هەریەك لەو پێکهاتووانەدا هەیە، کە چەندین بەرژەوەندیی جۆراوجۆر و، فەرمانبەریی ڕێکوپێك و، ئەنجامی جیاجیای پڕ لە دانستیان تێدایە.

کەواتە جێگیر کردنی گەردیلە لەو پێکهاتووانەدا بەو شێوەیەی کە هیچ زیانێك نەدات لەو ئەنجام و داناییانەی کە لەو پەیوەندی و فەرمانبەرییانەوە پەیدا بوون، لەگەڵ پارێزگاری کردنی ئەو پەیوەندی و فەرمانبەرییانە.. دیارە ئەم کارە تایبەتە بەو کەسەوە کە دارای موڵکی گەردوونە و کاروباری هەموو شتێکی بەدەستە.

بۆ نموونە: ئەو گەردیلەیەی کە لە بیلبیلەی چاوی "تۆفیق"دا جێگیر بووە، پەیوەندیی لەگەڵ: دەمارە هەستیار و بزۆکەکانی چاودا و، خوێنبەر و، خوێنهێنەر و، دەموچاو و، سەر و، پاشان لەگەڵ لەش و، ئنجا لەگەڵ مرۆڤەکەدا بە گشتی، هەیە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە هەریەك لەمانەدا کارمەندیی خۆی بەجێ دەهێنێت و سوودی خۆیشی دەگەیەنێت.

بوونی ئەم پەیوەندی و سوودانە و، بوونی دانست و ڕێکوپێکیی تەواو لە هەریەك لەمانەدا، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە:

ئەو کەسەی ئەو لەشەی بە هەموو ئەندامەکانیەوە بەدی هێناوە، هەر تەنها ئەو کەسەیە کە دەتوانێت ئەو گەردیلەیەش لەو شوێنەدا جێگیر بکات. بە تایبەتی ئەو گەردیلانەی کە بۆ رۆزیدان هاتوون و لەگەڵ کاروانی رۆزیدا دێن و دەڕۆن، ئەمانە، بەپێی رێسا دێن و دەڕۆن و، بە دانایییەکی وەهایش گەشتی خۆیان دەکەن کە ژیریی ژیرانی تێدا سەرسام ماوە.. پاشان زۆر بە وردی و رێکوپێکی دەڕۆنە ناو چەندین پلە و چینی جیاجیا و جۆراوجۆرەوە و، هەنگاوی خاوەن هەستانە دەنێن، بێ ئەوەی هیچ هەڵەیەك بکەن، تا بەرە بەرە و هەنگاو بە هەنگاو دێنە ناو جەستەی ئەو زیندەوەرە، ئنجا لەوێیش لە چوار پاڵێوگەدا دەپاڵێورێن و دەڕۆن تا دەگەنە ئەو ئەندام و خانانەی پێویستیان بە رۆزییە، یارمەتییان دەدەن و بەپێی یاسای "دەست رەنگینی و سەخاوەتمەندی" ئەو رۆزییانەیان لەسەر شانی خڕۆکە سوورەکانی خوێن بۆ دەبەن و فریایان دەخەن.

لەمەوە بە روونی تێدەگەین کە: ئەو کەسەی ئەم گەردیلانەی ئاوا بەناو هەزاران مەنزڵ و چینی جۆراوجۆردا برد و بە دانایی گەیاندنیە جێی خۆیان، بێ هیچ گومانێك، دەبێ رۆزیدەرێکی، دەسترەنگینی، بەدیهێنەری، میهرەبان بێت و، چ ئەستێرەکان و چ گەردیلەکان لە بەردەم توانستی ئەودا یەکسان بن!

پاشان هەموو گەردیلەیەك وێنەیەکی ناوازە و نەخش و نیگارێکی قەشەنگ لە بەدیهێنراوەکەدا دەنەخشێنێت، بە چەشنێ کە:

یان ئەوەیە: ئەو گەردیلەیە لە جێی فەرماندەرێکی ئەوتۆدایە کە دەستەلاتی بەسەر یەك بە یەك و کۆی گشتیی ئەو گەردیلانەدا هەیە و، لە هەمان کاتیشدا لە ژێر دەستەلات و فەرمانی یەك بە یەك و کۆی گشتیی ئەو گەردیلانەدایە و.. ئاگادارییەکی تەواوی لەو وێنە ناوازە و سەرسوورهێنەرانە و لەو نەخش و نیگارە جوان و پڕ لە داناییانەدا هەیە، بۆیە بەدییان دەهێنێت! خۆ ئەمەش هەزاران مەحاڵی تێدایە!

یان: ئەم گەردیلەیە، خاڵێکە لە لایەن قەڵەمی توانست و یاسای قەدەری خواوەندەوە، فەرمانی بزووتنی پێ دراوە و ئەمیش ئەنجامی دەدات.

بۆ نموونە: ئەو بەردانەی کە لە گومەزی مزگەوتی "ئەیاسۆفیا"دان، ئەگەر بە گوێڕایەڵیی فەرمانی بەناکەیان لەوێدا جێگیر نەبووبن، ئەوا دەبێت یەك بە یەکی ئەو بەردانە وەك "سینانی ئەندازیار"[1] لە پیشەی بەنناییدا کارامە و لێهاتوو بێت و، بەسەر هەموو بەردەکانی

---

(١) گەورەترین ئەندازیاری بەناوبانگی تورکە و لە نێوان ساڵەکانی: (١٤٨٩-١٥٧٨ز)دا ژیاوە. سەرپەرشتیی بنیاتنانی چەندین مزگەوتی گەورەی کردووە، گرنگترینیان مزگەوتەکانی: (سەلیمییە، سولەیمانییە، شاهزادە)ن. (وەرگێڕ)

تردا فەرماندەر بێت و لە هەمان كاتیشدا لە ژێر فەرمان و دەستەڵاتیاندا بێت!

واتە: فەرمان بۆ بەردەكانی تر دەربكات و بڵێت: "ئەی بەردینە! وەرن با پێكەوە یەكبگرین، تاكو نەكەوین"!

ئەو گەردیلانەش كە لە بەدیهێنراواندان، بە هەمان جۆرن، چونكە لەچاو گومەزەكەی "ئەیاسۆفیا"دا داهێنانكاری و، وردەكاری و، جوانیی تابلێی زیاتریان تێدایە و، بە هەزاران جاریش سەرسوورهێنەرترن و خاوەنی دانایی گەلێ زیاترن.. جا ئەگەر ئەم گەردیلانە گوێڕایەڵی فەرمانی بەدیهێنەری مەزنی گەردوون نەبن، ئەوا دەبێت هەرچی وەسفی كەماڵ هەن و تەنها شایستەی خواوەندن، بە یەك بە یەكی ئەو گەردیلانە بدرێت و پێیان ڕەوا ببینرێت!

بیرێكی چەندە سەیرە!! كاتێ ئەو ماددیە كافرانە سەرپێچییان لە بوونی خواوەند كرد، ئاوا بەپێی ئەو ڕێڕەوەی گرتیانەبەر، ناچار بوون باوەڕ بە چەندین خوای درۆینەی زۆرو زەبەندەی بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەكان بكەن!

هەر لەم ڕووەوەیە كە مرۆڤی كافری سەرپێچی كار بەرامبەر بە "بوون"ی خواوەند، چەندە فەیلەسووف و زاناش بێت، هەر بە نەزان دادەنرێت و، لە ڕاستیشدا تابلێی نەزانە!

## خاڵی سێهەم

ئەم خاڵە ئاماژە بۆ "شەشەم دانایی مەزن" دەكات، كە لە كۆتایی خاڵی یەكەمدا بەڵێن درا باس بكرێت، كە ئەمەیە:

لە پەراوێزی پرسیاری دووهەمی وتەی بیست و هەشتەم (پەیامی بەهەشت)دا ئەمەی خوارەوە باس كراوە:

یەكێكی تر لەو هەزاران حیكمەتانەی كە لە ئاڵوگۆڕ و بزووتنی گەردیلەكانی ناو لەشی زیندەوەراندا هەن، ئەوەیە كە: ئەو گەردیلانە بە "ژیان" ڕووناك دەبنەوە و، واتا و ناوەڕۆك پەیدا دەكەن. بەمەش وایان لێ دێت كە شایانی ئەوە دەبن لە بنیاتنانی جیهانی دوارۆژدا بەكار بهێنرێن.

بەڵێ، زیندەوەر و، مرۆڤ، تەنانەت ڕووەكیش وەك میوانخانە و، سەربازگەی مەشق كردن و، قوتابخانەی پەروەردەیی فێربوونی ڕێنمایی وان بۆ ئەو گەردیلانە، بە چەشنێ كە ئەو گەردیلانە كاتێ دەڕۆنە ئەوێ، ڕووناك دەبنەوە. وەك بڵێی لەوێ مەشق دەكەن و فەرمان وەردەگرن. ئنجا بەوەش كە هەریەكەیان فەرمانبەریی خۆی بە ڕێكوپێكی ئەنجام

دەدات، ئەوا شیاویی ئەوەیان دەست دەکەوێت کە ببن بە گەردیلەی جیهانی مانەوەی هەمیشەیی و دوارۆژی زیندوو کە هەموو شتێکی بە "ژیان" ئاوەدان کراوەتەوە.

**پرسیار:**

بە چی‌دا بوونی ئەم "دانایی"یە لە جووڵە و بزووتنی گەردیلەدا دەزانرێت؟

**وەڵام:**

*یەکەم*: بەهۆی دانستی خواوەندی داناوە دەزانرێت، ئەو دانستەی کە بە ڕێسا کارگوزارەکانی ناو بوونەوەران و دانایی‌یەکانی نێوانیان چەسپاوە. چونکە ئەو دانستەی خواوەند کە چەندین دانایی تایبەتی زۆری بە بچووکترین شتی هەندەکی سپاردووە، هەرگیز ناگونجێ بزووتنی گەردیلەکان بێ هیچ دانایی‌یەك واز لێ بهێنێت و پشت گوێی بخات، ئەو جموجووڵانەی کە لە گەردیلەکاندان و لەناو لافاوی بوونەوەراندا کارمەندی‌یەکی تایبەتی مەزن دەردەخەن و هۆی دەرکەوتنی چەندین داهێنانکاریی دانایانەن.

پاشان "دانست" و "فەرمانڕەوایەتیی خواوەند" کە هەرگیز هیچ بەدیهێنراوێك - بەرامبەر بەو کارەی ئەنجامی دەدات - لە پاداشت، یان کەماڵ، یان پلە، بێ بەش ناکات، چۆن گەردیلە کار پێ سپێرراوەکان و خزمەتگوزارە هەرە زۆرەکانی خۆی، بێ "ڕووناکی" یان بێ "پاداشت" پشت گوێ دەخات؟

*دووهەم*: خواوەندی دانای زانا توخمەکان دەجووڵێنێت و بۆ ئەنجامدانی چەندین کاری مەزن دەیانخاتە کار، بەمەش بەرزیان دەکاتەوە بۆ پلەی "کانزایی‌یەکان" تاکو ئەم بەرزکردنەوەیە ببێت بە پاداشت بۆیان لە ڕێی سەرکەوتنیاندا بە پلەکانی "کەماڵ"دا.. گەردیلەی "کانزایی‌یەکان"یش دەجووڵێنێت و لە چەندین فەرمانبەری‌دا دەیانخاتە کار و، تەسبیحات کردنی تایبەتیی خۆیانیان فێر دەکات و، بەمەش پلەی "زیندەوەرێتیی ڕووەکی"یان دەداتێ.. گەردیلەکانی "ڕووەك"یش دەبزوێنێت و بەکاریان دەهێنێت و دەیانکات بە ڕۆزیی شتانی تر، بەمەش خواوەند نیعمەتی خۆی دەبەخشێت پێیان و پلەی نەرمونیانی "زیندەوەران"یان دەداتێ.. گەردیلەکانی "زیندەوەران"یش لە ڕێی ڕۆزی‌یەوە دەخاتە کار و دەیانگەیەنێتە پلەی ژیانی "مرۆڤایەتی".. پاشان بەوەی کە گەردیلەکانی لەشی "مرۆڤ" چەندین جار بە چەند پاڵێوگەیەکدا دەبرێن و پاکژ دەکرێنەوە و نەرمونیانی و ناسکی بەدەست دەهێنن، ئەوا خواوەند پلەیان بەرز دەکاتەوە و دەیانبات بۆ ناسکترین و بەڕێزترین شوێن لە لەشدا کە "مێشك" و "دڵ"ی مرۆڤە.

لەمەوە کە باس کرا تێ‌دەگەین کە: جموجووڵی گەردیلەکان بێ مەبەست و دانایی نی‌یە، بەڵکو ئەم گەردیلانە بەرەو جۆرە کەماڵێك، کە شایستەیانن، دەدرێنەبەر.

سێ‌هه‌م: هه‌ندێ له‌ گه‌ردیله‌كانی زینـده‌وه‌ران - وه‌ك گه‌ردیلـه‌كانی نـاوك و تۆوه‌كـان - نوورێكی مه‌عنه‌وی و، نـه‌رمونیانی و، تایبه‌تكاری‌یه‌كی ئـه‌وتۆیان ده‌ست ده‌كه‌وێت، كه‌ بـه‌ وێنه‌ی: "گیان" و "فه‌رمانڕه‌وا"یان لـێ دێـت سه‌باره‌ت بـه‌ گه‌ردیلـه‌كانی تـره‌وه‌، ته‌نانـه‌ت بـۆ دره‌خته‌ زه‌به‌لاحه‌كه‌ی خۆیشیان.

به‌خشینی ئه‌م پله‌یه‌ بهم گه‌ردیلانه‌ له‌ نێوان گه‌ردیله‌كانی تری ئـه‌و دره‌ختـه‌دا، پاداشـت و ئه‌نجامی جێ‌به‌جێ كردنی چه‌ندین فه‌رمانبـه‌ریی ورد و كـار و ئـه‌ركی مه‌زنـه‌. ئه‌مـه‌ش به‌ڵگه‌یـه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌:

كاتێ ئـه‌م گه‌ردیلانـه‌، بـه‌ فـه‌رمانی به‌دیهێنـه‌ری دانـا، كـاره‌ سروشـتی‌یه‌كانیان جێ‌بـه‌جێ ده‌كه‌ن، نـه‌رمونیانی و، نوورێكـی مه‌عنـه‌وی و، پله‌یـه‌كی بڵنـد و، ڕێنمـایی كردنێكی بـه‌رزیان ده‌ست ده‌كه‌وێت، هه‌ریه‌كه‌یان به‌ گوێره‌ی جۆری جموجوڵی خۆی و، به‌پێی دره‌وشـانه‌وه‌ و به‌رزیی ئه‌و ناوه‌ جوانانه‌ی خوای گه‌وره‌ كه‌ تیایاندا ده‌دره‌وشێنه‌وه‌.

**به‌ پوختی:**

★ به‌دیهێنه‌ری دانا، خاڵێكی "كه‌ماڵ" و ڕووناكی‌یه‌كی "بوون"ی بۆ هه‌موو شتێك دانـاوه‌ كـه‌ له‌گـه‌ڵی‌دا بگونجێ و شـیاوی بێـت. ئیـتر ئـه‌و شـته‌ بـه‌ره‌و ئـه‌و خـاڵی "كـه‌ماڵ"ه‌ی بـه‌پێی توانایی‌یه‌ك كه‌ پێی به‌خشیوه‌، ده‌داته‌به‌ر تا ده‌یگه‌یه‌نێته‌ ئه‌وێ.

ئـه‌م یاسـا "پـه‌روه‌ردگاری"یـه‌ی خـواوه‌نـد، هـه‌روه‌ك لـه‌ هـه‌موو ڕووه‌ك و زینده‌وه‌رانـدا هـه‌یـه‌ و له‌ كاردایه‌، له‌ مادده‌ بێ گیانه‌كانیشدا هه‌یه‌ و به‌رده‌وام كاری خۆی ڕاده‌په‌ڕێنێت. به‌ ڕاده‌یه‌ك كه‌ خواوه‌ند پله‌ی خاك و خۆڵی ئاسایی تا پله‌ی ئـه‌ڵماس و بـه‌رده‌ گرانبـه‌هاكانی تـر به‌و یاسایه‌ به‌رز ده‌كاته‌وه‌.

لـه‌م ڕاسـتی‌یه‌وه‌، سـووچێكی یاسـایه‌كی مـه‌زن ده‌رده‌كـه‌وێت، كـه‌ "یاسـای په‌روه‌ردگارێتی"یه‌.

★ هه‌ر ئه‌و به‌دیهێنه‌ره‌ ده‌ستڕه‌نگینه‌، كاتێ زینده‌وه‌ران ده‌خاته‌ كار بۆ جێ‌بـه‌جێ كردنـی یاسای مه‌زنی "زاوزێ"، ئه‌وا تام و له‌زه‌تێكی هـه‌نده‌كی‌یان ده‌داتێ و ئه‌مـه‌یان بـۆ ده‌كـات بـه‌ پاداشتی ئه‌نجامدانی ئه‌و فه‌رمانبه‌ری‌یـه‌ی سه‌رشـانیان.. هـه‌روه‌ها ئـه‌و زینده‌وه‌رانـه‌ی كـه‌ بـۆ جێ‌به‌جێ كردنی چـه‌ند فه‌رمانێكی په‌روه‌ردگاری‌یانه‌ كاریان پێ ده‌سپێرێت - وه‌ك بولبـول و هه‌نگ - پاداشتێكی به‌رزی "كه‌ماڵ"یان پێ ده‌به‌خشـێت، كه‌ پله‌ی: بڵاو كردنه‌وه‌ی شـه‌وق و شادی و خۆشی‌یه‌.

له‌م ڕاستی‌یه‌وه‌، سووچێكی یاسایه‌كی مه‌زن ده‌رده‌كـه‌وێت، كـه‌ "یاسـای ده‌سـتڕه‌نگینی و سه‌خاوه‌تمه‌ندی"یه‌.

★ هەروەها مادەم "ڕاستی"ی هەموو شتێك ڕووی لە درەوشانەوەی یەکێك لە ناوە جوانەکانی خواوەندە و، وەك ئاوێنەیەکی تیشکدەرەوەی ڕووناکی‌یەکانی ئەو ناوە وایە، ئەوا ئەم شتە لە هەر بارێکی جوانی‌دا بێت، جوانی‌یەکەی هی جوانی و بەرزیی ئەو ناوەی خواوەندە. چونکە ئەو ناوەی خوای گەورە داخوازی ئەو جوانی‌یەیە و هی ئەوە لەو شتەدا دەدرەوشێتەوە، ئیتر ئەو شتە بە خۆی بزانێت یان نا. چونکە ئەو بارودۆخە جوانی‌یە، لە ڕوانگەی "ڕاستی"یەوە، دەبێ ببێت.

لەم ڕاستی‌یەوە، سووچێکی یاسایەکی مەزن دەردەکەوێت، کە "یاسای ئارایشتکاری و جوانی"یە.

★ هەروەها مادەم ئەو پلە و کەماڵەی کە بەدیهێنەری دانا بەپێی یاسای "دەستڕەنگینی و سەخاوەتمەندی" بە هەر شتێکی دەبەخشێت، ئەوا دوای تەواوبوونی ماوە و تەمەنی ئەو شتە، ئەو پلەیەی لێ ناسێنێتەوە، بەڵکو بەروبووم و ئەنجام و چییەتیی مەعنەوی و ناوەرۆك و گیانەکەی - گەر گیاندار بێت - دەهێڵێتەوە. بۆ نموونە: خواوەند ناوەرۆك و بەروبوومی ئەو کەماڵاتانەی کە دەستی مرۆڤ دەکەون دەیانهێڵێتەوە، بە ڕادەیەك کە ئەو شوکرانەبژێری و سوپاسگوزاری‌یانەی مرۆڤی ئیماندار بەرامبەر ئەو میوەجاتانەی دەیانخوات، بۆ خواوەند پێشکەشیان دەکات، خوای گەورە لە پاداشتی ئەمەدا جارێکی تر لە بەهەشت لە شێوەی میوەی بەرجەستە و پاك و خاوێندا بەو ئیماندارەی دەبەخشێتەوە.

لەم ڕاستی‌یەوە، سووچێکی یاسایەکی مەزن دەردەکەوێت، کە "یاسای میهرەبانی"یە.

★ پاشان بەدیهێنەری دانا لە هیچ شتێکدا زیادەڕەوی(الإسراف) و کاری نابەجێ ناکات. بە ڕادەیەك داروپەردووی ماددیی بوونەوەرە مردووەکانیش، کە لە پایزدا ئەرکی سەرشانیان تەواو بوو، لە بنیاتنانی بەدیهێنراوانی نوێی بەهاردا بەکار دەهێنێتەوە.

لەبەر ئەمە، یەکێك لە داخوازی‌یەکانی دانستی پەروەردگار ئەوەیە: ئەم گەردیلە بێ گیان و بێ هەستانەی زەوی کە ئەرکی فەرمانبەریی سەرشانی خۆیان لە دنیادا بەجێ هێناوە، لە دروستکردنی بەشێکی بینای دواڕۆژدا بەشدار بکات، ئەو دواڕۆژەی کە بە بەڵگەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ﴾ (إبراهيم:٤٨) و ئاماژەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَإِنَّ الدَّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ﴾ (العنكبوت:٦٤) هەرچی‌یەکی تێدایە زیندوون و دارای هەستن.. ئنجا لەبەر ئەوەش کە پشت گوێ خستن و بەکارنەهێنانی ئەو گەردیلە ڕووخاوانەی دنیا، یان فڕێدانیان بەرەو "نەبوون"، بە زیادەڕەوی و بێ‌مەبەستی دادەنرێت.. ئەوا بەپێی داخوازی‌یەکانی دانستی خواوەند ئەو گەردیلانە لەوێ بەکار دەهێنرێنەوە.

لەم ڕاستی‌یەوە، سوو چێکی یاسایەکی مەزن دەردەکەوێت، کە: "یاسای دانایی"یە.

★ پاشان زۆربەی ئاسەوار و شوێنەوار و مەعنـەوییات و بەروبوومی ئەم دنیایە و ئەنجامی کرداری کار پێ سپێرراوانی وەك: "جیننی و ئادەمیزاد" و لاپـەڕەی کردەوەکـانی ژیـانی دنیایان و، گیان و، لەشیان، تێکڕا بۆ بازاڕ و پیشانگای دواڕۆژ دەنـێررێن. مـادەم ئەمـە وایـە، کەواتە بەپێی "دادگەری" و "دانایی" دەبێت گەردیلەکانی زەوییـش، کـە هـاوەڵ و هـاودەم و خزمەتگوزاری ئەو بەروبووم و واتایانـە بـوون، لەگـەڵ داروپـەردووی ئـەم دنیایـەی کـە دەڕووخێـنرێت، بـۆ جیـهانی دواڕۆژ بنێررێن و لـە بنیاتنـانی ئـەو جیهانـەی ئـەوێدا بـەکار بـهێنرێن. ئەمـەش دوای ئـەوەی کـە ئـەم گەردیلانـە بـە ئـەنجامدانی ئـەو کارانـەی پێیـان سپێررابوون، کـامڵ بـوون و پێگەیشـتن، واتـە دوای ئەوەی کـە ڕووناکی و خزمـەتگوزاریی "ژیان"یان دەست کەوت و بوون بە هۆیەك بۆ چەندین تەسبیحاتی "ژیان".

لەم ڕاستی‌یەوە، سوو چێکی یاسایەکی مەزن دەردەکەوێت، کە "یاسای دادگەری"یە.

★ پاشان هەروەك "گیان" بەسەر لەشدا زاڵە، ئەو فەرمانە تەکوینی‌یانەش کـە بـۆ مـاددە بـێ گیانەکان دەرچوون و بە قەڵەمی قەدەری خوای گەورە نووسراون، بە هەمان جۆر بەسەر ئەو ماددانەدا زاڵ و دەستەڵاتدارن. بـەم پێـیە، ئـەو ماددانـە بـە ڕێسایەکی دیـاری کراو و بـەپێی داخوازیی نووسینی مەعنەویی قەدەری خواوەند دەکەونە ڕێ و جێی خۆیان دەگرن.

بۆ نموونە: ماددەکانی هەموو جۆرەکانی هێلکە و، بەشـەکانی ئـاوی مـەنی و، جۆرەکـانی ناوك و، چەشنەکانی تۆو، بەپێی جیاوازیی فەرمانە تەکوینی‌یەکان، کە قەڵەمی قەدەری خوای گـەورە بـە چـەند جـۆر و شـێوەیەکی جیاجیـا نووسـیونی، جۆرەهـا نـوور و پلـەی جیاجیـا وەردەگرن. چونکە ئەو ماددانە لەو ڕووەوە کە "ماددە"ن دارای یەك چییـەتین[1]، بـەڵام دەبـن بەهۆی نەش و نماکردنی چەندین بوونەوەرانی لەژمارەبـەدەر و، بـەم چەشـنە دەبـن بـە خـاوەنی چـەندین پلـە و نـووری جیاجیـا و جۆراوجـۆر. کەواتـە ئەگـەر گەردیلەیـەك لـە خزمەتگوزاری‌یەکی "ژیان"دا کـار بکـات و بەشـداریی ئـەو تەسبیحاتانە بکـات کـە "ژیـان" چـەندەها جـار بەرامبـەر خـوای پـەروەردگار دەریـاندەبڕێت و، لـەوێ ئـەو کـارەی خراوەتـە ئەستۆیەوە جێ‌بەجێی بکات، بێ گومان قەڵەمی قەدەری خواوەنـد، کـە هیـچ شـتێکی لـێ ون نابێت و، لەسەر داخوازیی زانیاریی بە هەموو شت ئاگای خواوەنـد، حیکمـەتی ئـەو واتایانـە لەسەر تەوێڵی مەعنەویی ئەو گەردیلانەدا دەنووسێت.

---

(١) بـەڵێ، هـەموو ئـەو ماددانـە لـە چـوار توخـم پێکـهاتوون کـە بریتین لـە: "ئۆکسـجین و هـایدرۆجین و ئـازوت و کـاربۆن" و هاوچەشـنیان، لەبـەر ئـەوە، لـە ڕووی پێکـهاتنی ماددی‌یـەوە ئـەو ماددانـە لـە یـەك دەچـن، بـەڵام جیاوازی‌یەکەیان لە نووسینی مەعنەویی قەدەردایە. (دانەر)

لەم ڕاستی‌یەوە، سووچێکی یاسایەکی مەزن دەردەکەوێت، کە: "یاسای زانستی بە هەموو شت ئاگا"یە.

کەواتە، بەپێی ئەمانەی باسمان کردن، گەردیلەکان بەریان بۆ بەرەڵا نەکراوە و بە هەڕەمەکی سەربەست نین[1].

**ئەنجام:**

ئەو حەوت یاسایانەی پێشوو، واتە: یاسای پەروەردگاری و، یاسای سەخاوەتمەندی و، یاسای جوانی و، یاسای میهرەبانی و، یاسای دانایی و، یاسای دادگەری و، یاسای زانستی بە هەموو شت ئاگا و.. یاسا مەزنەکانی تری هاوچەشنیان، هەریەکەیان لەو سووچەی کە لێیەوە دەردەکەوێت "ناوی هەرە مەزن"ی خواوەند و درەوشانەوەیەکی مەزنی ئەو ناوە مەزنە، پیشان دەدات. لەم دەرکەوتن و درەوشانەوەیەشەوە ئەوە تێدەگەین کە: ئاڵوگۆڕ و بزووتنی گەردیلەکانیش، وەکو گشت بوونەوەرانی تری ئەم دنیایە، بەپێی ئەو دەستوورانەی کە قەڵەمی قەدەری خواوەند کێشاونی و.. بە گوێرەی ئەو فەرمانە تەکونی‌یانەی کە توانستی خوا دەری دەکەن و.. لەسەر بناغەی تەرازوویەکی زانستیی سەرنەکەر و.. لە پێناوی چەندین دانایی بەرزدا، دەبزوون و دەجوولێنەوە، وەك بڵێی بەرەو جیهانێکی تری بەرزتر خۆیان ئامادە بکەن، ئاوا ئاڵوگۆڕ و جووڵانەوەیان دەردەکەوێت[2]. هەر بەم بۆنەیشەوەیە لەشی زیندوویان وەك قوتابخانەیەکی ئەوتۆ داناوە کە گەردیلە گەشتیارەکان وانەی تێدا وەردەگرن و شتی تێدا فێر دەبن و.. وەك سەربازگەیەك مەشقی تێدا دەکەن و.. وەك

(١) وەڵامی حەوت بڕگەکەی پێشووە. (دانەر)

(٢) چونکە ئەوەتا ئەوەی ئێمە بە چاوی خۆمان دەیبینین، لە: بڵاوکردنەوەی نووری "ژیان" بە زۆری لەم جیهانە نزم و چڕەدا و، داگیرساندنی ئەم نوورە بە کارمەندی‌یەکی بەردەوام و لەوپەڕی دەستڕەنگینی‌دا، تەنانەت بڵاوکردنەوەی نووری "ژیان" بە چەشنێکی تابلێی زۆر لە بێ‌نرخترین و بۆگەنترین شتدا و پاکژکردن و جوانکردنی ئەو مادده بێ‌نرخانە بەهۆی نووری ژیانەوە.. ئەمەی کە ئێمە بە چاوی خۆمان دەیبینین، ئاماژەیەکی زۆر نزیکە لە ڕاشکاوی‌یەوە بۆ ئەوەی کە:

خواوەند ئەم جیهانە چڕە بێ‌گیانە دەتوێنێتەوە و بە جموجوولی گەردیلەکان و نووری ژیان جوانی دەکات و دەیبریسکێنێتەوە، تاکو بەمە، بۆ جیهانێکی تری زیندووی ناسکی بەرز و خاوێنی ئامادە بکات. وەك بڵێی بۆ مەبەستی ئامادەکردنی ئەم جیهانە بۆ کۆچکردنی بەرەو جیهانێکی ناسك و جوان، ئارایشتی دەدات و دەیڕازێنێتەوە.

جا ئەو کەسانەی کە ژیری‌یە تەسکەکەیان جێی زیندووبوونەوەی مرۆڤی تێدا نابێتەوە، ئەگەر بە نوور و لە ڕوانگەی قورئانی پیرۆزەوە بڕوانن، ئەوا دەبینن کە:

یاسایەك هەیە بە چاو دەبینرێت، ئەویش: "یاسای ڕاگیرکاریی هەموو شتێکە". ئەم یاسایە، وەك چۆن سەربازەکانی سوپا کۆدەکرێنەوە، ئەویش ئاوا گەردیلەکان کۆدەکاتەوە و دەستکاری‌یان دەکات. وەك لە بەرچاودایە. (دانەر)

میوانخانەیەکی پەروەردەییش تیایدا پەروەردە دەکرێـن. دەشتوانین بە "حەدس"ی ڕاست[(١)] بڕیار بدەین کە: لەشی زیندوو سەبارەت بە گەردیلەکان - لە ڕاستیدا - وایە.

**پوختەی ئەمانەی پێشوو:**

وەك لە "وتەی یەکەم"دا باس کراوە و چەسپاوە، هەرچی شت هەیە دەڵێت : "بسم الله".. گەردیلەش وەکو هەموو تاك و کۆمەڵێکی تری بوونەوەران، بە زمانی حاڵ، "بسم الله" دەڵێت و بەو پێیە هەڵسوکەوت دەکات.

بەڵێ، بە گوێرەی بەڵگەی ئەو سێ خاڵەی باسمان کردن، هەرچی گەردیلە هەیە لە سەرەتای جموجوولیدا بە زمانی حاڵ دەڵێت : ﴿**بِسْمِ اللهِ الرحمن الرحيم**﴾. واتە: بە ناو و هێز و توانا و ڕوخسەتی خوا و لە پێناوی ئەودا دەجووڵێم. هەروەها هەموو دەستە و تاقمێکی گەردیلەکان دوای تەواوکردنی جموجووڵ و کاری سەرشانیان، وەکو هەموو بەدیهێنراوانی تر، بە زمانی حاڵ دەڵێن: ﴿**الْحَمْدُ لله رَبِّ الْعَالَمِينَ**﴾.

کەواتە هەموو گەردیلەیەك، وەك نووکی خامەیەکی بچووکی توانستی خواوەند خۆی دەنوێنێت لە وێنەکێشانی هەموو بەدیهێنراوێکی ناوازەی جواندا، کە وەك پارچە شیعرێکی سەناخوان و سوپاسگوزاری خواوەند وایە.

تەنانەت هەموو گەردیلەیەك وەك نووکی دەرزیی چەندین قۆڵی مەعنەویی "گرامافۆن"ێکی[(٢)] مەزنی پەروەردگاریانە خۆی دەردەخات و، ئەو دەرزییە بەسەر چەند قەوانێکدا دەخولێتەوە - کە بەدیهێنراوانی پەروەردگارن - ئەم دەرزییانە، بەم کارەیان، زمانی ئەو قەوانانە بە چەندان قەسیدەی سەنا و ستایش خوانی پەروەردگار دەخەنە گۆ و، چەندین سروودی تەسبیحاتی خوای گەورەیان پێ لێ دەدەن.

﴿**دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلامٌ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لله رَبِّ الْعَالَمِينَ**﴾.

﴿**سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا الاّ مَا عَلَّمْتَنَا انَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ**﴾.

﴿**رَبَّنَا لا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ اذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً انَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ**﴾.

اللهم صلِّ على سيدنا محمد صلاة تكون لك رضاءً ولحقه أداءً، وعلى آلـه وصحبه وإخوانه وسلم. وسلمنا وسلم ديننا. آمين يا رب العالمين.

---

(١) "حَدْس" لە زمانی عەرەبیدا بە "خەملاندن و گومان" دەوترێت. لە زانستی مەنتیقیشدا - کە لێرەدا ئەو واتا زاراوەییە زیاتر مەبەستە - بە شتی وا ئاشکرا دەڵێن کە مرۆڤ بێ بیر لێکردنەوە یەکسەر هەستی پێ بکات. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست ئامێری دەنگداری گرامافۆنە کە لە بریی شریتی کاسێت قەوانی تێدا بەکار دەهێنرا. (وەرگێڕ)

# وتەی سی و یەکەم

## لە بارەی میعراجی پێغەمبەرەوە ﷺ دەدوێت

بێدارکردنەوەیەك:

مەسەلەی میعراج ئاکام و ئەنجامێکە لەسەر بناغە و پایەکانی ئیمان ڕاگیر دەکرێت. کەواتە نوورێکە لە ڕووناکیی پایەکانی ئیمانەوە سەرچاوە دەگرێت و بەهرەمەندی ڕووناکی دەبێت. بۆیە بەڵگەکانی چەسپاندنی میعراج سەبارەت بە کەسانی مولحید و ئەوانەی ئینکاریی پایەکانی ئیمان دەکەن، ڕاستەوخۆ باس ناکرێن. تەنانەت هەر نابێ بۆ کەسێك باس بکرێن کە باوەڕی بە خوای گەورە نەبێت و تەسدیقی پێغەمبەری ئازیز ﷺ نەکات، یان ئینکاریی مەلائیکەت و ئاسمانەکان بکات. مەگەر دوای ئەوەی کە ئەو پایانەی ئیمانی لە پێشدا بۆ بچەسپێنرێت. لەبەر ئەوە، لەم پەیامەدا ڕووی گوفتارمان ئاراستەی ئەو ئیماندارە دەکەین کە گرفتاری گومان بووە و میعراجی بەلاوە دوورە. وا پشت بەخوا لەم بوارەدا ئەندازەیەکی ئەوتۆی بۆ ڕوون دەکەینەوە کە سوودی لێ وەربگرێت و شیفایش بە دەردی گومانەکەی ببەخشێت. بەڵام جار بەجار ئاوڕ لەو مولحیدەش دەدەینەوە کە وەك گوێبیستێك ڕاوەستاوە و، بەو ئەندازەیەی کە سوودی پێ بگات قسە ئاراستەی ئەویش دەکەین.

لە چەند پەیامێکی تردا چەند بریسکانەوەیەکی ڕاستیی میعراج باس کراوە. وا دوای داواکاری و جەختی برا خۆشەویستەکانم پشتمان بە یارمەتیی چاودێریی خوای گەورە بەست، تاکو ئەو بریسکانەوە پەرش و بڵاوانە کۆ بکەینەوە و لەگەڵ ئەسڵی خودی ڕاستییەکەدا گرێیان بدەین، بۆ ئەوەی لە ئەنجامدا ئاوێنەیەك بەدەست بهێنین کە بە یەك جار کەماڵاتی جوانیی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەربخات.

بسم الله الرّحـــمن الرّحيم

﴿سُبْحانَ الَّذي أَسْرى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إلى الْمَسْجِدِ الأَقْصا الَّذي بارَكْنـــا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آياتِنا إنَّهُ هُوَ السَّميعُ البَصيرُ﴾ (الإسراء:١)

﴿إنْ هُوَ إلاَّ وَحْيٌ يُوحَى ❁ عَلَّمَهُ شَـديدُ الْقُوى ❁ ذُو مِرَّةٍ فَاسْـتَوَى ❁ وَهُوَ بِـالأُفُقِ الأَعْلى ❁ ثُمَّ دَنا فَتَدَلَّى ❁ فَكانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنـى ❁ فَأَوْحى إلى عَبْدِهِ مَا أَوْحى ❁ مَـا كَذَبَ الفُؤادُ مَا رَأى ❁ أَفَتُمارونَهُ عَلى مَا يَرى ❁ وَلَقَدْ رءآهُ نَزْلَةً أُخْرى ❁ عِنْـدَ سِـدْرَةِ الْمُنْتَهى ❁ عِنْدَها جَنَّةُ الْمَأْوى ❁ إذْ يَغْشى السِّدرَةَ مَا يَغْشى ❁ مَا زاغَ الْبَصَرُ وَما طَغـى ❁ لَقَدْ رَأى مِنْ آياتِ رَبِّهِ الْكُبْرى﴾ (النجم:٤-١٨)

له گه‌نجینه‌ی مه‌زنی ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه‌ی سه‌ره‌تادا ته‌نها دوو "هێما" باس ده‌كه‌ین كـه پاڵیـان بـه ده‌ستوورێكی ڕه‌وانبێژی‌یه‌وه داوه لـه ڕانـاوی: ﴿إنَّـــهُ﴾دا، چونكـه ئـه‌و دوو هێمایـه پـه‌یوه‌ندی‌یان بـه‌م مه‌سـه‌له‌یه‌مانه‌وه هه‌یـه، وه‌ك لـه پـه‌یامی موعجـیزاتی قورئـانی‌دا ڕوونمـان كردوونه‌ته‌وه:

(قورئانی پیرۆز دوای ئه‌وه‌ی باسی ئیسرای پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستی ﷺ كرد له سـه‌ره‌تای میعراجـه‌وه – واتـه لـه "مسـجد الحرام"ه‌وه بـۆ "مسـجد الاقصـی" – تـا كۆتایی‌یه‌كـه‌ی، كـه سووره‌تی "النجم" ئاماژه‌ی بۆ ده‌كات، دوای ئـه‌وه، ئـه‌م ئایه‌تـه‌ی سـه‌ره‌وه‌ی بـه ﴿إنَّـهُ هُـوَ السَّميعُ البَصيرُ﴾ كۆتایی پێ هێنا..

جا ئه‌و ڕاناوه‌ی كه له ﴿إنَّهُ﴾دایه، یان بۆ خـوای گـه‌وره ده‌گه‌ڕێتـه‌وه، یـان بـۆ پێغه‌مبـه‌ری ئازیز ﷺ..

ئه‌گه‌ر بۆ پێغه‌مبه‌ر ﷺ بگه‌ڕێته‌وه، ئه‌وا یاساكانی ڕه‌وانبێـژی و موناسـه‌به‌تی هـاتنی گوفتـار ئه‌وه ده‌گـه‌یه‌نن كـه: ئـه‌م گه‌شـته جوزئی‌یـه‌ی میعـراج هێنـده گه‌شـت و گـوزار و ڕۆشـتنی گشتی و به‌رزبوونه‌وه‌ی كوللیی تێدایه كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ له كـاتی به‌رزبوونـه‌وه و ده‌مـی بڕینـی پله هه‌مه‌كی‌یه‌كانی ناوه جوانه‌كانی خوای گه‌وره‌دا، كه تا "سدرة المنتـهى" و "قـاب قوسـين أو أدنـى" ده‌گرنـه‌وه، هـه‌موو نیشـانه و به‌ڵگـه په‌روه‌ردگاری‌یـه‌كان و گشـت ئـه‌و كـاره ناوازانه‌ی سنعه‌تی خواوه‌ندی بیستووه و بینیوه كه لـه‌و گه‌شته‌دا بـه‌رچاو و گوێـی كـه‌وتوون. ئه‌مه‌ش به‌ڵگـه‌یه لـه‌سـه‌ر ئه‌وه‌ی كـه ئه‌م گه‌شته جوزئی‌یه لـه حوكمی كلیلێكدایه بۆ گه‌شتێكی كـوللـی و گشتی به ناو كاره سه‌رسووڕهێنه‌كانی سنعه‌تی خوای گه‌وره‌دا.

بەڵام ئەگەر ڕاناوەکە بۆ خوای گەورە بگەڕێتەوە، ئەوا ئەو کاتە واتاکەی بەم جۆرە دەبێت:

خوای گەورە بەندە خۆشەویستەکەی بۆ حوزووری خۆی بانگ کردووە، تاکو ئەرکێکی پێ بسپێرێت و کارێکی بخاتە ئەستۆ. بۆیە لە "مسجد الحرام"ەوە شەوڕەویی پێ کرد بەرەو مزگەوتی ئەقصا، کە کۆگای پێغەمبەرانە. جا دوای چاو پێکەوتنی پێغەمبەران و ئاشکرا کردنی ئەوەی کە ئەم پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ میراتگری ڕەها و ڕاستەقینەی بناغەی ئایینەکانی هەموو پێغەمبەرانە - درووديان لەسەر بێت - گەشتێکی بەو پێغەمبەرە خۆشەویستە کرد بۆ ناو مولك و مەلەکووتی خۆی تا گەیاندیە "سدرة المنتـــهى" و بە ئەندازەی نزیکیی هەردوو سەری کەوانەیەك یان کەمتر، لە خۆی نزیکی خستەوە.

بەم جۆرە ئەم گەشت و سەفەرە هەرچەند میعراجێکی جوزئی بووە و، ئەو کەسەش کە بۆ ئەوێ بەرز کراوەتەوە بەندەیەك بووە لە بەندەکان، بەڵام ئەم بەندەیە "ئەمانەت"ێکی هێندە مەزنی پێ سپێرراوە کە پەیوەندیی بە هەموو گەردوونەوە هەیە و، "نوور"ێکی ڕووناکی بەخشی وای لەگەڵدایە کە هەموو بوونەوەران ڕووناك دەکاتەوە و سەروسیمای واتا و ناوەڕۆکیان دەگۆڕێت و بەو نوورە دەیانڕەخشێنێت، جگە لەوەی کە ئەم بەندەیە "کلیل"ێکی ئەوتۆی پێیە کە دەتوانێت دەرگای بەختەوەریی هەمیشەیی و نیعمەتی بەهەشتی هەتاهەتایی پێ بکاتەوە.

لەبەر هەموو ئەمانە، خوای گەورە خۆی بە: ﴿**إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ**﴾ وەسف دەکات، تاکو دەری بخات کە هێندە حیکمەتی بەرز و بڵند لەو "ئەمانەت" و "نوور" و "کلیل"ەدا هەن کە سەرجەمی بوونەوەران و بەدیهاتووان و سەرانسەری گەردوون لە ئامێز دەگرن).

ئەم نهێنییە مەزنەش چوار بناغەی هەیە:

یەکەمیان: نهێنیی پێویست بوونی میعراج چییە؟

دووهەمیان: حەقیقەتی میعراج چییە؟

سێهەمیان: حیکمەتی میعراج چییە؟

چوارەمیان: بەرهەم و سوودەکانی میعراج چین؟

# بناغه‌ی یه‌كه‌م

## نهێنی و حیكمه‌تی پێویستیی میعراج

بۆ نموونه، ده‌وترێ:

خوای گه‌وره له جه‌سته و شوێن خاوێنه و، به‌پێی ده‌قی ئایه‌تی پیرۆزی: ﴿**وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ**﴾ (ق:١٦) بۆ هه‌موو شتێك له هه‌موو شتێك نزیكتره، به ڕاده‌یه‌ك كه هه‌موو وه‌لی‌یه‌ك له پیاوچاكان ده‌توانێت له دڵی خۆی‌دا له‌گه‌ڵ په‌روه‌ردگاری خۆی بدوێت و به دڵ موناجاتی له‌گه‌ڵدا بكات..

له كاتێكدا كه هه‌موو وه‌لی‌یه‌ك ده‌توانێت له دڵی خۆی‌دا موناجات له‌گه‌ڵ په‌روه‌ردگاری‌دا بكات، ئه‌ی بۆچی "ویلایه‌تی ئه‌حمه‌دی" دوای سه‌فه‌رێكی دوور و گه‌شتێكی درێژخایه‌نی "میعراج" به‌و موناجاته گه‌یشت و پێی به‌هره‌مه‌ند بوو؟

**وه‌ڵام:** به دوو نموونه ئه‌م نهێنی‌یه ته‌ماوی‌یه له تێگه‌یشتنه‌وه نزیك ده‌خه‌ینه‌وه، تۆش به باشی گوێیان لێ ڕابگره. ئه‌م دوو نموونه‌یه له وته‌ی دوازده‌هه‌مدا له كاتی ڕوونكردنه‌وه‌ی نهێنیی ئیعجازی قورئان و حیكمه‌تی میعراجدا باس كراون:

○ **نموونه‌ی یه‌كه‌م:**

پادشای دنیایی دوو جۆره گوفتار و چاوپێكه‌وتن و، دوو شێوه فه‌رمایشت و ڕێزلێنان و ئاوڕدانه‌وه‌ی میهره‌بانیی هه‌یه:

*یه‌كه‌میان*: گوفتارێكی تایبه‌تی‌یه كه به‌هۆی ته‌له‌فۆنێكی تایبه‌تی‌یه‌وه له‌گه‌ڵ یه‌كێك له هاووڵاتیانی‌دا سه‌باره‌ت به كارێكی هه‌نده‌كی و ئیشێكی تایبه‌تیی خۆیه‌وه له‌گه‌ڵی‌دا ده‌یكات.

*ئه‌وی تریان*: قسه‌كردنه به ناوی پادشایه‌تیی پڕ شكۆ و به ناونیشانی خه‌لافه‌تی گه‌وره و به سیفه‌تی فه‌رمانڕه‌وایه‌تیی گشتی و بۆ مه‌به‌ستی بڵاوكردنه‌وه‌ی فه‌رمانه پادشایی‌یه‌كانی له هه‌موو لایه‌كدا به فه‌رمانێكی به‌رز كه بۆ ده‌رخستنی گه‌وره‌یی و سام و شكۆی خۆی ده‌ری‌ده‌كات. كه‌واته ئه‌م یه‌كه‌یان گوفتارێكه له‌گه‌ڵ یه‌كێك له نێرراوانی خۆی، یان یه‌كێك له فه‌رمانبه‌ره گه‌وره‌كانی‌دا كه په‌یوه‌ندیی به‌و كارانه‌وه هه‌یه.

به وێنه‌ی ئه‌م نموونه‌یه – وَلِلّٰهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَى – به‌دیهێنه‌ری گه‌ردوون و خاوه‌نی سه‌رانسه‌ری "مولك و مه‌له‌كووت" و فه‌رمانڕه‌وای ڕه‌های ئه‌زه‌لییش: دوو جۆره گوفتار و ڕێزلێنان و ئاوڕدانه‌وه‌ی میهره‌بانیی هه‌یه:

یەکەمیان: جوزئی و تایبەتی‌یە.
دووهەمیان: کوللی و گشتی‌یە.
جا میعراجی پێغەمبەر ﷺ دیمەنێکی بەرز و شکۆمەندی "ویلایەتی ئەحمەدی"یە و، بە شێوەیەکی هێندە کوللی ئەو ویلایەتەی دەرکەوت کە لە سەرووی هەموو ویلایەتەکانی ترەوە بوو.

چونکە ئەم ویلایەتە، شەرەفمەندبوونە بە موناجات‌کردن و گوفتاری ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوای گەورەدا بە ناوی: "رب العالمين" و بە ناونیشانی: "بەدیهێنەری بوونەوەران".

○ **نموونەی دووهەم:**

پیاوێك ئاوێنەیەکی بەدەستەوەیە و ڕووەو خۆر ڕایگرتووە. دیارە ئاوێنەکە بە ئەندازەی گەورە و بچووکیی خۆی ڕووناکی‌یەك وەردەگرێت کە هەر حەوت ڕەنگەکانی شەبەنگی خۆری تێدایە. کەواتە ئەم پیاوە بەپێی ئەندازەی ئاوێنەکەی پەیوەندیی بە خۆرەوە دەبێت و، هەر بەو ئەندازەیەش دەتوانێت سوود لە خۆر وەربگرێت، ئەگەر ڕووناکیی ئاوێنەکەی ئاراستەی ژوورە تاریکەکەی یاخود "شەتڵگا" تایبەتی و بچووکە سەرگیراوەکەی خۆی بکات. بەڵام هێشتا هەر سوودێکی کەم لەو ڕووناکی‌یە وەردەگرێت، چونکە تەنها بەپێی توانای ئاوێنەکەی لە ڕووناکیی خۆر بەهرەمەند دەبێت، نەك بە ئەندازەی گەورەیی خۆر!

لە هەمان کاتدا پیاوێکی تر واز لە ئاوێنەکە دەهێنێت و ڕاستەوخۆ ڕوو دەکاتە خۆر و سەیری سام و شکۆی خۆر دەکات و پەی بە گەورەیی خۆر دەبات، ئنجا دەچێتە سەر چیایەکی بڵند و سەیری درەوشانەوەی دەستەڵاتداریی فراوان و شکۆمەندیی خۆر دەکات و - بێ پەردە - ڕووبەڕووی ڕادەوەستێت. پاشان دەگەڕێتەوە لە خانووە بچووك و "شەتڵگا" سەرگیراوە تایبەتی‌یەکەی خۆیدا چەند کلاوڕۆژنەیەکی فراوان ڕووەو خۆری ناوجەرگەی ئاسمان دەکاتەوە و، موناجات و گفتوگۆیەك لەگەڵ ڕووناکیی بەردەوامی خۆری ڕاستەقینەدا ساز دەکات.

بەم جۆرە، ئەم پیاوە دەتوانێت ئەم چاوپێکەوتن و گفتوگۆیەی، کە ئاوێتەی شوکرانە و پێزانینە، لەگەڵ خۆر و ڕووناکی‌یەکەیدا - بە زمانی حاڵ - ساز بکات و بڵێت:

(ئەی ئەو خۆرەی کە لەسەر تەختی جوانیی جیهاندا دانیشتوویت! ئەی گوڵە گەشاوەکەی ڕووی ئاسمان! ئەی ئەو خۆرەی کە جوانی و ڕووناکیت بە زەوی و، زەردەخەنە و شادیت بە گوڵان بەخشیوە! هەروەك گەرمی و ڕووناکیت بە گشت لایەکی جیهاندا پەخشاندووە، ماڵ و شەتڵگا بچووکەکەی منیشت بەسەرکردووەتەوە و لە گەرمی و ڕووناکی‌یەکەی خۆت پێ بەخشیون)!

ئەم پیاوە دەتوانێت، بە زمانی حاڵ، ئـەم چەشنە گفتوگۆیـە لەگـەڵ خـۆردا بکـات، بـەڵام خاوەنی ئاوێنەکە ناتوانێت بەم شێوازە ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵدا بکـات، چونکـە شـوێنەواری ڕووناکیی خۆر بەپێی سنووری ئاوێنەکەی دەبێت و بـە ئـەندازەی توانـای ڕەنگدانـەوەی ئـەو ئاوێنەیە ڕووناکیی دەست دەکەوێت.

هەر بە وێنەی ئەم دوو نموونەیە، زاتـی مـەزنی خواوەنـدی تـەنیا و صەمـەدیش، کـە نـووری ئاسمانەکان و زەوی و پادشای ئەزەل و ئەبەدە، بە دوو شێوە لە ماهییـەتی مرۆڤانـەی ئـادەمیزاد دەردەکەوێـت و دەدرەوشێتەوە. ئەم دوو شێوەیەش گەلـێ پلەی بێسنووریان لەخۆ گرتووە.

*شێوەی یەکەم:* دەرکەوتنێکە لـە ئاوێنـەی دڵـدا. بـەهۆی پەیوەستـیەکی پـەروەردگاری و پەیوەندی بوون لـەگەڵیدا، بە ڕادەیەك کە هەموو مرۆڤێك لە دەمی گەشت و سلووك و بڕینی پلەکاندا، بەپێی توانا و لێهاتنی خۆی و بە گوێـرەی درەوشـانەوەی نـاو و سیفەتەکان، پایـە و گفتوگۆ و موناجـاتێکی - چ جوزئـی و چ کوللیـی - لەگـەڵ ئـەو نـوورە ئەزەلیـیـەدا هەیـە. پلـەکانی زۆربـەی هـەرە زۆری ئـەو ویلایەتانـەی کـە لـە سـایەی نـاوە جوانـەکان و سـیفەتە مەزنەکاندا هەنگاو دەنێن و سلووك دەکەن، لەم بەشەن.

*شێوەی دووهەم:* دەرکەوتنی درەوشـانەوەی خـوای گەورەیـە بـۆ بـەرزترین و گـەورەترین کەسـی گـرۆی مـرۆڤ، بـە درەوشانەوەی زاتـی مـەزنی خـۆی و بـە گـەورەترین پلــەی نـاوە جــوانەکانی. چـونکــە لەبــەر ئــەوەی مــرۆڤ ڕووناکــترینی بـــەروبوومەکانی درەختـــی بوونەوەرانە و لـە هەمووشیان زیاتر سیفەت و توانا و لێهاتنی تێدا جەم بـووە، ئـەوا دەتوانێـت هەموو ئەو درەوشـانەوانەی نـاوە جوانـەکانی خـوای گـەورە، کـە لـە "وجـوود"دا بەرجەستە بوون، بە یەك جار لە ئاوێنەی ڕۆحی خۆیدا دەربخات!

نـهێنیی "میعراجـی ئەحـمەدی" بریتییـە لـەم درەوشـانەوە و دەرکەوتنـە، بـە چەشـنێك کـە ویلایەتەکـەی سـەرەتایە کە بـۆ پێغەمبەرایەتییەکـەی. "ویلایـەت" بـە وێنــەی پیــاوی یەکــەمی نموونەی دووهەم بە ناو سێبەردا دەڕوات، بەڵام "پێغەمبەرایەتی" سێبەری تێدا نییە، بـەڵکو بـە وێنـەی پیـاوی دووهـەمی نموونـەی دووهـەم ڕاسـتەوخۆ ڕووی لـە تـەنیایی زاتـی مـــەزنی پەروەردگارە.

سەبارەت بە میعراجیشەوە، کـە کەرامـەتێکی هەرەمـەزن و پلـەی هەرەبـەرزی "ویلایـەتی ئەحـمەدی"یە، ئەوا هێندە بەرزبوونەوە و پلەی یـەك لـە دوای یـەکی بڕی هـەتا گەیشـتە پلـەی "پێغەمبەرایەتی".

ڕووی ناوەوەی میعراج: ویلایەتە، چونکە لە "خەلق"ەوە بۆ لای "حەق" سەرخراوە..

بەڵام ڕواڵەتی دەرەوەی میعراج: پێغەمبەرایەتی‌یە، چونکـە لـە لایەن "حـەق تـەعالا"وە بۆ لای سەرجەمی "خەلق" هاتووە و ڕەوانە کراوە.

"ویلایەت" بریتی‌یە لـە: بڕینی پلـەکانی نزیکبوونـەوە لـە خـوای گـەورەوە و، پێویستی بـە کات و بڕینی چەند پلەیەکی زۆر هەیە.

بـەڵام "پێغەمبەرایـەتی" کـــە مـــەزنترین ڕووناکی‌یـــە، ڕووی لـــە دەرکـــەوتنی نـــهێنیی: "ئەقرەبییەت"ی خوای گەورەیە، کە یەك چاوتروو کاندنی کتوپڕی و چرکەیـەکی خێرای بـە خوڕەمی سەروزیادە، بۆیە لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە کە: پێغەمبەر ﷺ یەکسـەری و خێرا لە میعراج گەڕاوەتەوە.

وا ئێستاش گوفتارمـان ئاراسـتەی ئـەو موڵحیـدە دەکـەین کـە لـە شـوێنی گوێبیسـتدا دانیشتووە و، پێی دەڵێین:

مادەم ئەم جیهانە وەك وڵاتێکی لەوپەڕی ڕێکوپێکی‌دا و، لە وێنەی شـارێکی لەڕادەبـەدەر هـاوسـەنـگ و ڕێـك و، کۆشـکێکی لـە ئەندازەبـەدەر ڕازاوە و جوانداـیـە، ئـەوا دەبـێ: فـەرمـانڕەوا و، خاوەن و، سنعەتکارێکی هەبێت.

جا مادەم ئەو خاوەنە مەزن و، فەرمانڕەوا کـامڵ و، سـنعەتکارە جوانـە هەیـە.. لـە لایـەکی تریشەوە مرۆڤێك هەیە کە خاوەنی ڕوانینێکی هەمەکی‌یە و، لـە ڕێی هەسـت و نەستەکانیەوە پەیوەندی‌یـەکی گشتیی بـەو جیـهان و وڵات و کۆشـکەوە هەیـە.. ئـەوا دەبێ ئـەو کردگـارە مـەزنـە پەیوەندی‌یەکی بەرز و بەتینی لەگەڵ ئەم مرۆڤەدا هەبێت کـە خـاوەنی ڕوانینێکـی ئـاوا هـەمـەکی و هەست و شعوورێکی ئاوەها گشتی‌یە. بێ هیـچ گومانێکیش گوفتاری قودسـی و ڕووتێکردنی بەرزی خۆی ئاراستەی ئەو مرۆڤە دەکات..

ئنجا مادەم لە نێـوان ئـەو کەسـانەی کـە بـەو پەیوەندی‌یـە بـەرزە بـەهرەوەر بـوون، هـەر لـە زەمـانی حـەزرەتی ئادەمـەوە - درووودی لەسـەر بێـت - تـا دنیـا دنیایــە، حـەزرەتی محەمـەدی پێغەمبەری ئەمین ﷺ بە شایەتیی ئاسەوارەکانی (واتە بـە حوکمڕانـی کردنـی بـۆ نیـوەی گـۆی زەوی و پێنج یەکی گرۆی مرۆڤایەتی و، گۆڕینی ڕوخساری مەعنەویی بوونەوەران و ڕووناك کردنەوەیان).. بە مەزنترین و ڕوونـترین شـێوە ئـەو پەیوەندی‌یـە بـەرز و بڵنـدەی دەرخستووە، ئەوا شایستەترین و شایانترین کەسێکە شەرەفمەندی ئەو میعراجە بێت کە مەزنترینی پلەکانی ئەو پەیوەندی‌یەیە!

# بناغەی دووهەم

## حەقیقەتی میعراج چی‌یە؟

**وەڵام:**

بریتی‌یە لە گەشت و گەڕان و بڕینی پلەکانی کەماڵات لە لایەن زاتی ئەحمەدی‌یەوە ﷺ.
ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە:

خوای گەورە بە چەند ناونیشان و ناوێکی جۆراوجۆر نیشانە و ئاسەوارەکانی پەروەردگارێتیی خۆی لە ڕێکخستنی بوونەوەراندا پێش‌چاو خستووە و.. مەزنیی پەروەردگارێتی‌یەکەشی بە کارسازی و بەدیهێنان لە ئاسمانی هەموو ئەو فەرمانگانەدا ئاشکرا کردووە کە هەر خۆی بەدیی هێناون و، کە هەر یەکە لەو ئاسمانانە خولگەیەکی مەزنی عەرشی پەروەردگاری و مەڵبەندێکی شکۆمەندی هەڵسوکەوتی خواوەندن.

جا خوای گەورە، یەك لە دوای یەکی ئەو نیشانە مەزن و شوێنەوارە گەورانەی پیشانی ئەو بەندە دەستنیشان کراوە هەڵبژاردەیەی خۆی داوە و، بە بوراق بەرزی کردووەتەوە و، لە فەرمانگەیەکەوە بۆ فەرمانگەیەکی دیکە و لە مەنزڵێکەوە بۆ مەنزڵێکی تر، بە وێنەی مەنزڵگاکانی مانگ، بردوویەتی و گشت پلە و پایە یەك لە دوای یەکەکانی بە چەشنی برووسکە پێ بڕیوە. تاکو پەروەردگارێتیی خوایەتیی خۆی لە ئاسمانەکاندا پیشان بدات و، دیدار و چاوپێ‌کەوتنیشی لەگەڵ یەك‌بەیەکی برا پێغەمبەرەکانی و هەریەکەیان لە مەقامی خۆی لەو ئاسمانانەدا بۆ ساز بکات.. بەم شێوەیە، پلە لە دوای پلەی پێ بڕی تا بەرزی کردەوە بۆ مەقامی "قاب قوسین" و، بە لێ‌درەوشانەوەی "ئەحەدییەت"یش شەرەفمەندی گوفتار و بینینی خۆی کرد، تاکو هەموو کەماڵاتێکی ئادەمی لەودا جەم بکات و، ئەو بەندەیەی بەهرەمەندی گشت درەوشانەوە خوایی‌یەکان ببێت و، شایەت بێت بەسەر هەموو چینەکانی بوونەوەرانەوە و، خەڵکی بەرەو دەسەڵاتداریی پەروەردگارێتیی خواوەند بانگ بکات و، ئەو شتانەشیان پێ ڕابگەیەنێت کە مایەی ڕەزامەندیی خواوەندن و، مەتەڵ و گرێ کوێرەی بوونەوەرانیشیان بۆ شی بکاتەوە و نهێنی‌یەکانیشیان بۆ بخاتە ڕوو.

دەتوانرێت ئەم ڕاستی‌یە بەرزە لە ڕوانگەی دوو نموونەوە ببینرێت.

❖ **نموونەی یەکەم:**

لە وتەی بیست و چوارەمدا ئەم نموونەیەمان بەمەی خوارەوە ڕوون کردووەتەوە:

"پادشـا"ی دنیـایی لـە نـاوەندی فەرمانگـەکانی حکومەتەکـەیدا چـەند ناونیشـانێکی جیاجیـای هەیە و، لـە نێـوان چینـەکانی ڕەعیەتـەکانیدا چـەند وەسـفێکی جۆراوجـۆری بـۆ دادەنرێت و، لە توێی یەك‌بەیەکی پلەکانی پادشاییەکەشیدا خاوەنی چەند نیشانە و نـاوێکی جیاجیایـە. بـۆ نموونـە: لـە فـەرمانگەکانی دادگـەریدا خـاوەنی نـاوی: "فـەرمانڕەوای دادگـەر"ە و.. لە فەرمانگە مەدەنییەکاندا بە ناونیشانی "پادشا" دەناسرێت و.. لـە فەرمانگـە سەربازییەکاندا دارای ناوی: "سەرکردەی گشتی"یە و.. لە فەرمانگە شەرعییەکانیشدا بـە ناونیشانی "خەلیفە" تەماشا دەکرێت.. بەم جۆرە، گەلێ ناونیشان و ناوی تری هەیە..

کەواتـە "پادشـا" لـەناو هـەموو یـەکێك لـە فەرمانگـەکانی دەوڵەتەکـەیدا پلـە و پایـە و کورسییەکی ئەوتۆی هەیە کە بە وێنەی عەرشێکی مەعنەویی ئەو وان. جا لەسەر ئەم بناغەیە، دەکـرێ ئـەم پادشا تـاك و تەنیایـە لـە نێـوان فەرمانگـەکانی ئـەو پادشـایەتییە و لـە نـاوەندی چینەکانی حکومەتدا خاوەنی هـەزار و یـەك نـاو بێـت، واتـە دەگونجێ هـەزار و یـەك عەرشـی هاوچەقی یەك لەناو یـەکی ببێـت، بـە ڕادەیـەك کـە دەڵێـی ئـەو پادشـا فەرمانڕەوایـە لـە هـەموو یەکێکی فەرمانگەکانی دەوڵەتەکەیدا ئامادەیە و، بـە کەسێتییە مەعنەوییەکـەی و تەلەفۆنـە تایبەتییەکەی ئاگای لە ڕووداوەکانی یەك بە یەکیانـە و، بـە یاسـا و ڕێسـاکانی خۆیشـی و لـە ڕێـی نوێنـەرەکانیـەوە لـە هـەمـوو یەکێکـی ئـەو چینانـەدا دەبینـرێت و خـۆیشـی هـەموویان دەبینێت و، بە دانست و زانست و هێزی خۆی لە پشـت پـەردەوە هـەموو پلەیـەك لـەو پلانـە بەڕێوە دەبات. چونکە هەموو فەرمانگەیەك مەڵبەند و جێگای تایبەتی خۆی هەیە کە حوکمـی هەریەکەیان لەوانی تر ناچێت و چینەکانیشیان لە یەکتر جیاوازە.

جـا بێ‌گومـان ئـەو پادشـایە، لـە گەشـتێکی فراوانـدا ئـەو کەسـەی کـە مەبەسـتیەتی و هەڵبژاردەی خۆیەتی، دەگێڕێت و، بەناو هەموو فەرمانگەکانی ئەو پادشاییەیدا دەیبـات و، سام و شکۆی دەوڵەتەکەی و مـەزنیی پادشـاییەکەی لـە هـەموو یـەکێکی ئـەو فەرمانگانـەدا پیشان دەدات و، یەك‌بەیـەکی ئـەو فەرمانـە حەکیمانـەی خـۆی بـۆ دەردەخـات کـە تایبـەتن بـە هەموو یەکێك لەو فەرمانگانەوە. بەم جۆرە، لە فەرمانگەیەکـەوە بـۆ فەرمانگەیـەکی دیکـە و، لـە چینێکـەوە بـۆ چینێکـی تـر، دەیبـات و بـەرزی دەکاتـەوە تـا دەیگەیەنێتـە پلـەی مـەقام و حوزووری خـۆی. ئنجـا دوای ئـەوە لـە لایـەن خـۆیەوە بـۆ لای هەمـوو خـەڵکی ڕەوانـەی دەکـات و، هـەندێ لـە فەرمانـە هەمـەکی و گشـتییەکانی خۆیشـی پـێ دەسـپێرێت کـە پەیوەندییان بە سەرجەمی ئەو فەرمانگانەوە هەیە.

ئێمەش بەم جۆرە لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە دەڕوانین و، دەڵێین:

پـەروەردگاری هـەموو جیهانـەکان، کـە پادشـای ئـەزەل و ئەبەدە، لـە نـاوەندی پلـەکانی

پەروەردگاریتی‌یەكەی‌دا گەلێ كاروبار و ناونیشانی جیاجیای هەیە، بەڵام هەموو یەكێك لەوانە بۆ یەكتری دەڕوانن..

هەروەها لە نێوان فەرمانگەكانی خوایەتی‌یەكەی‌دا چەند نیشانە و ناوێكی جۆراوجۆری هەیە، بەڵام لە یەكتری‌دا دەبینرێن..

هەروەها لە توێی كار بەڕێ‌كردنە مەزنەكانی‌دا چەند درەوشانەوە و دەركەوتنێكی جیاوازی هەیە، بەڵام لە یەكتر دەچن..

هەروەها لەناو هەڵسوكەوتەكانی توانستەكەیشی‌دا چەند ناونیشانێكی هەمە جۆرەی هەیە، بەڵام هەریەكەیان ئەوانی تر دەناسێنێت..

هەروەها لە ناوەندی درەوشانەوەی سیفەتەكانی‌دا چەند مەزهەرێكی خاوێنی جیاجیای هەیە، بەڵام یەكتر دەردەخەن..

هەروەها لە نێوان درەوشانەوەی كارەكانی‌دا چەند هەڵسوكەوتێكی لەیەك نەچووی هەیە، بەڵام یەكتری تەواو دەكەن.

هەروەها لەناو سنعەت و بەدیهاتووەكانی‌دا چەند درەوشانەوەیەكی بەسام و شكۆ بۆ پەروەردگاریتی‌یەكەی هەیە، بەڵام هەریەكەیان چاوی لەوانی ترە.

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە مەزنە:

خوای گەورە ئەم گەردوونەی بەپێی تەرتیبێكی هێندە سەیر ڕێكخستووە كە مرۆڤ تووشی سەرسامی و سەرسووڕمان دەكات، چونكە هەر لە گەردیلەكانەوە، كە بە بچووكترین چینەكانی بوونەوەران دادەنرێن، تا دەگاتە ئاسمانەكان.. ئنجا لە یەكەم چینی ئاسمانەكانیشەوە تا دەگاتە عەرشی ئەعزەم، بریتین لە چەند ئاسمانێك كە یەك لەسەر یەك بنیات نراون و، هەر ئاسمانێكیان لە حوكمی بن‌میچی جیهانێكی تردایە و، بە وێنەی عەرشێكی پەروەردگاری و مەڵبەندێك وایە بۆ هەڵسوكەوتە خوایی‌یەكان.

خۆ هەرچەند دەگونجێ هەموو ناوەكان بە هەموو ناونیشانەكانیانەوە - لە ڕوانگەی ئەحەدییەتەوە - لە هەموو ئەو فەرمانگە و چینانەدا دەربكەون، بەڵام هەروەك تەنها ناونیشانی "فەرمانڕەوای دادگەر" لە فەرمانگەی دادگەری‌دا زاڵ و سەرەكی دەبێت و ناونیشانەكانی تر شوێنكەوتەی ئەو ناونیشانە دەبن و بۆی دەڕوانن، بە هەمان جۆر - وللّٰه المثل الأعلی - لە هەموو چینێكی بوونەوەران و لە هەموو یەكێك لە ئاسمانەكانی‌دا ناونیشان و ناوێكی خوای گەورە زاڵ و فەرمانڕەوا دەبێت و، ناونیشانەكانی تر شوێنكەوتە و لە ناوەندی ئەودا دەبن.

بۆ نموونە: حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - كە شەرەفمەندی ناوی "القدیر"ی خوای گەورەیە، لە چ ئاسمانێكدا چاوی بە پێغەمبەری سەردارمان كەوت ﷺ، ئەوا خوای

گەورە لە فەرمانگەی ئەو ئاسمانەدا ڕاستەوخۆ بە ناونیشانی: "القدیر" دەرکەوتووە.

نموونەیەکی تر: ناونیشانی "المتکلم"یش کە حەزرەتی مووسای - دروودی لەسەر بێت - پێ بەهرەمەند بووە، بەسەر فەرمانگەی ئەو ئاسمانەدا زاڵە کە مەقامی حەزرەتی مووسایە، دروودی لەسەر بێت.

جا پێغەمبەری ئەعزەم ﷺ (کە بە ئیسمی ئەعزەم بەهرەمەند بووە و، پێغەمبەرایەتی‌یەکەشی گشتی‌یە و، هەموو درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورەشی دەست کەوتووە) لەبەر ئەوەی پەیوەندیی لەگەڵ سەرجەم فەرمانگەکانی پەروەردگاریتی‌دا هەیە.. ئەوا دەبێ حەقیقەتی میعراجەکەی داخوازی چاوپێ کەوتنی هەموو پێغەمبەران بێت کە لەو فەرمانگانەدا خاوەن مەقامن و، دەبێ بەناو هەموو چینەکاندا بڕوات و تێپەڕ ببێت.

❖ **نموونەی دووهەم:**

ناونیشانی "سەرکردەی مەزن" کە یەکێکە لە ناونیشانەکانی پادشا، لە هەموو فەرمانگەیەکی سەربازی‌دا دەرکەوتنێکی هەیە، هەر لە فەرمانگەی سەرکردەی گشتی و سەرۆکایەتیی ئەرکانەوە، کە فەرمانگەیەکی هەمەکی و فراوانە، تا دەگاتە فەرمانگەی عەریف، کە فەرمانگەیەکی هەندەکی و تایبەتە..

بۆ نموونە: هەموو تاکە سەربازێك وێنە و نموونەی سەرکردایەتیی هەرەمەزنی سوپا لە خودی عەریفەکەی‌دا دەبینێت، بۆیە ڕوو لە عەریفەکەی دەکات و فەرمانەکان لەو وەردەگرێت. بەڵام کە ئەم سەربازە خۆی بوو بە "عەریف" ناونیشانی ئەو سەرکردایەتی‌یە لە فەرمانگەی سەرۆکەکەی‌دا دەبینێت کە "رأس العرفا"یە و بۆ فەرمان وەرگرتن ڕوو لەو دەکات. ئنجا کە بوو بە "رأس العرفاء" نموونە و دەرکەوتنی سەرکردایەتیی گشتی لە فەرمانگەی "ملازم"دا دەبینێت، چونکە فەرماندەی گشتی کورسی‌یەکی تایبەتیی لەو مەقامەدا هەیە.. بەم جۆرە ناونیشانی ئەو سەرکردایەتی‌یە مەزنە لە هەموو فەرمانگەکانی تری وەك فەرمانگەی: "نەقیب و ڕائید و فەریق و موشیر"دا دەبینێت، بەپێی فراوانیی یان تەنگ و تەسکیی هەریەك لەو بازنانە.

ئێستا ئەگەر فەرماندەی هەرەمەزن بیەوێت ئەرك و فەرمانبەری‌یەك کە پەیوەندیی بە هەموو فەرمانگە سەربازی‌یەکانەوە ببێت بە تاکە سەربازێك بسپێرێت و، بیەوێت بۆ مەقامێکی هێندە بڵند بەرزی بکاتەوە کە لە لایەن هەموو ئەو فەرمانگانەوە ببینرێت و ئەویش هەموو ئەوان ببینێت، وەك بڵێی بەڕێوەبەر و سەرپەرشتیکاری هەموویان بێت، ئەوا بێ هیچ گومانێك سەرکردەی هەرە مەزن ئەو تاکە سەربازە بە ناو هەموو ئەو فەرمانگانەدا دەبات، هەر لە فەرمانگەی عەریفەوە تا فەرمانگە مەزنەکەی خۆی، تاکو هەموویان ببینێت و ئەوانیش

هەموویان ئەو ببینن. پاش ئەوە لە مـەقامی حـوزووری خـۆی وەری دەگرێـت و، بـە گوفتـاری خۆی شەرەفمەندی دەكات و، بە فەرمانەكانی خۆی و مەدالیاكانیشی ڕێزی لـێ دەگرێـت.. پاشان لە هەمان كاتدا و بە یەك چاوتروو كاندن دەینێرێتەوە بۆ ئەو شوێنەی كە لێوەی هاتووە.

پێویسـتە سـەرنج بـۆ لای خـاڵێكی نـاو ئـەم نموونەیـە ڕابكێشـین، كـە بریتی‌یـە لـەوەی: ئـەم پادشایە ئەگەر كۆڵەوار و دەستەوسان نـەبێت و، هـەروەك هـێزی ڕواڵـەتیی هەیـە توانسـتێكی ڕۆحی و مەعنەویشی هەبێت، ئەوا كەسانێكی وەك فەریق و موشیر و ملازم ناكات بە وەكیل، بەڵكو هەر بە خودی خـۆی لـە هـەموو شـوێنێكدا ئامـادە دەبێـت و هـەر خـۆی ڕاستەوخۆ لـە پشتی چەند پەردەیەك و چەند كەسێكی خاوەن مەقامـەوە فەرمانـەكانی دەردەكـات، هـەروەك دەگێڕنەوە كە چەند پادشایەك هەبوون كـە ئـەولیای كـامڵ بـوون و، لـە چـەندین فەرمانگـەی زۆر و لە شێوەی هەندێ كەسدا، فەرمانەكانی خۆیان جێبەجێ كردووە.

بەڵام ئەو ڕاستی‌یەی كە ئێمە لە چاویلكەی ئەم نموونەیەوە بـۆی دەڕوانـین بریتی‌یـە لـەوەی كـە: حوكـم و فـەرمان ڕاستەوخۆ لـە لایـەن سـەركردەی گشتی‌یەوە بـۆ هـەموو یـەكێك لـە فەرمانگەكان دێت و، لەوێدا بە فەرمان و ویست و هێزی خۆی، كـە هـیچ كۆڵەواری‌یـەكی تێدا نی‌یە، دەستبەجێ، جێبەجێ دەكرێت.

جا بە وێنەی ئەم نموونەیە:

هــەموو چینێــك لــە چینــەكانی بەدیــهاتووان و تاقمــەكانی بوونــەوەران، هــەر لــە گەردیلەكانەوە تـا هەسـارەكان و لـە مێرووەكانـەوە تـا ئاسمانـەكان، ئەوانـەی كـە بـە كـەماڵی ملكەچی و گوێڕایەڵی: فەرمانەكانی پادشای ئەزەل و ئەبەد و، كاروبارەكانی فـەرمانڕەوای زەوی و ئاسمانەكان و فەرماندەی موتڵەقی خاوەن فەرمانی "كن، فیكـون"یـان تێـدا جێبـەجێ دەكرێـت.. لـە هـەموو یـەكێك لـەو چینانــەدا، فەرمانگــەی پەروەردگاریتی‌یـەكی مـەزن و، فـەرمـانڕەوایەتی‌یەكی زاڵ، بـە چـەنـد چینێكـی جۆراوجـۆر و چـەنـد تـاقمێكی جیاجیـای بـچـووك و گەورە و جوزئی و كوللی دەبینرێت، كە هەریەكەیان ڕووی لەوی ترە.

جا بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕێی بینینی ئەنجامدانی ئەركی بەندایەتی‌یـە جۆراوجۆرەكـانی هەموو چینەكانەوە، لە گشت ئامانجە بەرزە خوایی‌یەكان و ئەنجامە مەزنەكانی نـاو گـەردوون تێ بگات..

هـەروەهـا بـۆ ئـەوەی بە بینینی دەسـتەڵاتـداریی پـەروەردگاریتیی مـەزنی خـوای گـەورە و سـام و شـكۆی فەرمانڕەوایەتی‌یـە خـاوەن عیزەتەكـەی پـەی بـەو شـتانە ببـات كـە مایـەی ڕەزامەندیی ئەو خاوەن مەزنی و گەورەیی‌یەن..

هەروەها بۆ ئەوەی ببێت بە بانگەوازكاری خەڵكی بۆ لای خوای گەورە..

ئەوا دەبێ بە ناو سەرتاسەری ئەو چین و فەرمانگانەدا بڕوات تا دەگاتە عەرشی ئەعزەم، کە ناونیشانی فەرمانگە مەزنەکەی خواوەندە و، دەبێ بڕواتە "قاب قوسین" واتە بچێتە مەقامێك لە نێوان "ئیمکان و وجوب"دا کە بە: "قاب قوسین" ئاماژەی بۆ کراوە و، موقابەلەی زاتی جوان و شکۆمەندی خوای گەورە بکات.

جا حەقیقەتی میعراج بریتی‌یە لەم ڕۆشتن و گەشت و موقابەلەیە!

ئنجا هەروەك هەموو مرۆڤێك لە ڕێی "ژیری"یەوە بە خێرایی ئەندێشە دەگەڕێت و.. هەموو وەلی‌یەکیش بە "دڵ" بە خێرایی هەورەبرووسکە جموجوولی خۆی هەیە و.. هەموو مەلائیکەتێك لە "جەستە نوورانی"یەکەی‌دا بە خێرایی ڕۆح لە عەرشەوە بۆ فەرش و لە فەرشەوە بۆ عەرش دێت و دەڕوات و.. ئەهلی بەهەشتیش بە خێرایی بوراق لە مەیدانی حەشرەوە بۆ بەهەشت و بەرەو مەودایەکی دووری زیاتر لە پێنج سەد ساڵ، بەرز دەبنەوە..

بە هەمان جۆر، جەستە و لەش و لاری حەزرەتی محەممەدیش ﷺ کە گەنجینەی ئامێرە بەرزەکانی و خولگەی چەندین کارمەندیی لەسنووربەدەری ڕۆحە بەرزەکەیەتی. بێ هیچ گومانێك، هاوگەشتی ئەو ڕۆحە محەممەدی‌یە دەبێت کە یەك پارچە نوورە و، لە توانا و لێهاتنی نووردایە و، ئنجا لە دڵی ئەولیاکان نیانتر و، لە ڕۆحی مردووان ناسکتر و، لە لەش و لاری مەلائیکەتانیش تەنکترە و، لە جەستەی ئەستێرەیی و تەنی میسالیش گەلێ ناسك و نیانترە.. بێ هیچ گومانێك، ئەو جەستەیە هاوگەشتی ئەم ڕۆحە دەبێت و لەگەڵ ئەو لەو میعراجەدا بۆ عەرشی ئەعزەم سەر دەخرێت و بەرز دەبێتەوە!

با ئێستاش سەیرێکی ئەو مولحیدە بکەین کە لە مەقامی گوێبیستدا دانیشتووە.

❑ وا بە دڵدا دێت کە ئەو مولحیدە لە دڵی خۆی‌دا دەڵێت:

من نە ئیمانم بە خوا هەیە و نە پێغەمبەریش دەناسم، ئیتر چۆن باوەڕ بە میعراج بکەم؟

ئێمەش پێی دەڵێین:

مادەم لە ڕاستی‌دا ئەم بوونەوەرانە هەن و، چەندین کار و بەدیهێنانیان تێدا دەبینرێت..

مادەم کاری ڕێکوپێك بێ بکەر و، کتێبی ڕەوان بێ نووسەر و، نەخش و نیگاری ناوازەش بێ وێنەکێش نەبووە و نابێت..

ئەوا دەبێ ئەم کارە سەرانسەر حیکمەتانەی کە هەموو شوێنێکی بوونەوەرانیان گرتووەتەوە: بکەرێکیان هەبێت و، ئەم نەخش و نیگارە ناوازە و نامیلکە ڕەوانانەش کە گۆی زەوی‌یان پڕ کردووە و لە هەموو وەرزێکدا نوێ دەبنەوە، دەبێ نیگارکێش و نووسەرێکیان ببێت.

ئنجا لەبەر ئەوەی کە بوونی دوو فەرمانڕەوا لە هەر شتێکدا ڕێسای ئەو شتە تێك دەدات و.. لە لایەکی تریشەوە ئێمە کە چاو دەگێڕین ڕێسا و ڕێکوپێکیی تەواو لە هەموو

شتێكدا ده‌بینین، هەر له‌ باڵی مێشەوە تا دەگاتە چراكانی ئاسمان..

ئەوا دەبێ ئەو فەرمانڕەوایە "تاك" و "تەنیا" بێت. چونكـه سنعەت و حیكمـەت لـه هـەموو بەدیهـاتووواندا هێنـده ورد و ناوازەن كه دەبێ سـنعەتكارەكەیان خـاوەنی تـوانستێكی ڕەهـا بێـت و توانای بەسەر هەموو شتێكدا هەبێ و له هەموو شتێكدا زانا بێت. چونكه ئەگـەر یـەك فەرمانڕەوای تاك و تەنیا نەبوایە ئەوا پێویست دەبوو بە ئەندازەی ژمـارەی بوونـەوەران خـوای جۆراوجۆر ببوایە و، ئەو كاتەش هەموو یەكێك لەو خوایانە لە یەك دەچوون و دژی یەكتریش دەبوون! دیارە لـه حاڵێكی وادا تێك نەچوونی ئـەو ڕێسـایە مـەحاڵێكی ئـەندەر هـەزار مـەحاڵ دەبێت!!

پاشان لەبەر ئەوەی چینەكانی ئەم بوونەوەرانە – وەك بـه ڕوونـی لـه بەرچاودایـە – هـەزار جار زیاتر لە (سوپای ڕێكخراو) ڕێكوپێكـی و گوێڕایـەڵی دەردەخـەن.. ئـەوەتا هەریـەك لـه جموجووڵەكانی ئەستێرەكان و خـۆر و مـانگ تـا دەگاتە ڕێكـوپێكیی گوڵـی چـواله، لـەو نیشـانـه و مەدالیایانەدا كه خاوەن توانستی ئەزەلی پێی بەخشیون و ئەو بەرگـه جوانانـەش كـه ئەو لەبەری كردوون و لـەو جموجـووڵ و كارانەشـدا كـه بـۆی دەستنیشـان كـردوون، هێنـده ڕێكوپێكیی نـاوازه و كـامڵ دەردەخـەن كـه هـەزار هـەزار جـار لـە سـەرووی ئـەو ڕێسـا و گوێڕایەڵی‌یەوەیـه سـوپا ئـەنجامی دەدات.. لەبـەر ئـەوە، ئـەم بوونەوەرانـە – بـه حـەتمی – خـاوەنێكی حـەكیمی خـاوەن دانستی ڕەهایـان هەیـە كـه لـه پشـت پـەردەی غەیبەوەیـە و، بەدیهاتووانیش چاوەڕوانی فەرمانەكانی ئەون تاكو لە خۆیاندا جێبەجێیان بكەن.

ئنجا مادەم ئەو خاوەن دانسته ڕەهایه، به شایەتیی هەموو كاروباره پڕ لـه حیكمەتـەكانی و بەو ئاسەواره مەزنانەش كه دەریاندەخات، پادشایەكی شكۆمەندە و..

بـەو چـاكه و نیعمەتانـەش كـه دەیانبـەخشـێت، پەروەردگارێـكی خـاوەن میـهرەبانیی فـراوانـه و..

بەو دروستكراوە ناوازانەش كه پێش‌چاوی خستوون، دروستكەر و داهێنكارێكی وایـه كه سنعەتی خۆی گەلێ خۆش دەوێت و..

بـەو ئارایشـته جـوان و سـنعەته ناوازانـەی كـه لـه هـەموو لایـەكدا بـڵاوی كردوونەتـەوە، دەردەكـەوێت كـه: بەدیهێنـەرێكی دانـایه، دەیـەوێت هـەستی سـەرسـووڕمان لای خـاوەن هـەسـت و شـعوورەكان بورووژێنێـت و سـەرنجی پێ‌جوان بوونـی بەدیـهاتووانی لـه لایـەن ئەوانەوە پێ ڕابكێشێت و..

ئنجا لەو جوانی‌یە دڵگیر و بێ وێنەیەوە، كه لە بەدیهێنانی جیهاندا بە ناوازەیی پێش چاوی خسـتووە، دەردەكـەوێت كـه: دەیـــەوێت بەدیـــهاتووە خـــاوەن هەســت و شـعوورەكانی

تێبگەیەنێت کە: مەبەستی لەم ئارایشتانە چی‌یە و؟ بوونەوەران لەکوێوە هاتوون و؟ بۆ کوێ دەڕۆن؟

مادەم ئەو فەرمانڕەوا دانا و کردگارە زانایە، ئاوەهایە .. ئەوا بێ هیچ گومانێك پەروەردگاریتی‌یە مەزنەکەی خۆی دەردەخات و ئاشکرای دەکات..

ئنجا لەبەر ئەوەی بە: دەرخستنی ئاسەوارەکانی لوتف و میهرەبانی و بڵاوکردنەوەی سنعەتە ناوازەکانی، دەیەوێت خۆی بناسێنێت و لای خاوەن هەستان خۆی خۆشەویست بکات، ئەوا بێ گومان، بەهۆی ڕاگەیەنەرێکی ئەمینەوە، ئەو داواکاری‌یانە ڕادەگەیەنێت کە لە خاوەن هەستانی دەوێت و، هەر لەم ڕێیەوە ئەو شتانەشیان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە مایەی ڕەزامەندیی ئەون. کەواتە بە حەتمی لە نێوان خاوەن هەستەکاندا یەکێك دەستنیشان دەکات کە پەروەردگاریتی‌یەکەی خۆی لە ڕێی ئەوەوە دەربخات و.. بانگەوازکارێك لە نێوان ئەواندا هەڵدەبژێرێت تاکو بە نزیکیی خۆی بەهرەمەندی بکات و هەواڵی بەدیهاتووە خۆشەویستەکانی خۆیشی لەو ڕێیەوە ڕابگەیەنێت و.. مامۆستایەك دادەنێت کە خاوەن هەستەکان لە ئامانجە بەرزەکانی خواوەند شارەزا بکات و، لەم ڕێیەوە کەماڵاتی خۆی دەربخات و.. ڕابەرێك دادەنێت کە خەڵکی شارەزای واتا و ناوەرۆکی بوونەوەران بکات تاکو ئەو مەتەڵەی کە لەم گەردوونەدا دایناوە، بە گرێ کوێرە و شی‌نەکراوەیی نەمێنێتەوە و، ئەو کاروبارە پەروەردگاری‌یانەش کە لەم بوونەوەرانەدا حەشاری داون، بێ واتا دەرنەچن و.. پێشەوایەك دەستنیشان دەکات کە خەڵکی بە ئامانجەکانی خواوەند ئاشنا بکات تاکو جوانکاری‌یەکانی سنعەتی خۆی - کە پێش‌چاوی خستوون - بێ‌هوودە و بێ‌سوود دەرنەچن و، بێ هیچ گومانێك لە نێوان ئەو خاوەن هەستانەدا یەکێکیان بۆ پلەیەکی بڵندتر لە هی هەموویان بەرز دەکاتەوە و ئنجا ئەو شتانەی تێدەگەیەنێت کە مایەی ڕەزامەندیی خۆین و، پاشان دەینێرێتەوە بۆ لای ئەوان.

مادەم "حەقیقەت" و "حیکمەت" داخوازی ئەمەن، ئەوا شایانترین و شایستەترین کەس کە بتوانێت مافی تەواو بەم کارمەندی و ئەرکانە بدات: حەزرەتی محەممەدە ﷺ. چونکە لە ڕاستی‌دا بە تەواوترین شێوە ئەو ئەرکانەی ئەنجام دا. شایەتی ڕاست و دادگەریش لەسەر ئەمە بریتی‌یە لەو جیهانی ئیسلامەی کە دایمەزراند و ئەو نوورە ڕووناکەی ئایینی ئیسلامیش کە ئاشکرای کرد..

لەبەر ئەمانە، دەبێ ئەم پێغەمبەرە بەڕێزەی خۆی ﷺ ڕاستەوخۆ بەرز بکاتەوە بۆ مەقامێکی هێندە بڵند کە لە سەرووی پلەی هەموو بوونەوەران و گشت بەدیهاتووانەوە بێت، تاکو بە ئامادەبوون لە بەردەم حوزووری پەروەردگاری هەموو جیهانەکاندا بەهرەمەند ببێت. کەواتە "میعراج" ئەم ڕاستی‌یە دەردەخات و ڕایدەگەیەنێت.

**پوختەی ئەم قسەیە:**

خواوەندی خاوەن دانستی ڕەها ئەم بوونەوەرە مەزنانەی ڕێکخستووە و ڕازاندوونیەتەوە تاکو ئەم چەشنە مەبەستە گەورە و ئامانجە بەرزانە دەربخات و.. ئنجا لە نێوان ئەم بوونەوەرانەشدا گرۆی مرۆڤی بەدی هێناوە کە دەتوانێت هەموو وردەکارییەکانی ئەم پەروەردگارێتییە گشتییە و سەرجەم ڕاستییەکانی ئەم خوایەتییە شکۆمەندە ببینێت.. جا بێ گومان ئەو خاوەن دانستە ڕەهایە لەگەڵ ئەم مرۆڤەدا دەدوێت و ئامانجەکانی خۆی تێدە گەیەنێت.

ئنجا لەبەر ئەوەی هەموو مرۆڤێك ناتوانێت بۆ بەرزترین مەقامی هەمەکی بەرز ببێتەوە و، بە تەواوەتی دەستبەرداری هەندەکێتی و "پلە نزمی" ببێت، ئەوا بێ گومان ئەو ئەرکە بە هەندێك لەو کەسە تایبەتمەندانە دەسپێرێت، تاکو پەیوەندیی لەگەڵ هەردوو لادا ببێت، واتە: دەبێ مرۆڤ بێت تاکو گرۆی مرۆڤ فێر بکات و بەو ئامانجە ناوبراوانەیان ئاشنا بکات، لە هەمان کاتیشدا خاوەنی ڕۆحێکی لەوپەڕی بەرزی و بلندیدا بێت تاکو ڕاستەوخۆ شەرەفمەندی گوفتاری خواوەند ببێت.

پاشان، لەبەر ئەوەی باشترین و گەورەترین کەس لەناو گرۆی مرۆڤدا کە ئامانجەکانی پەروەردگاری جیهانیانی ڕاگەیاندبێت و، ئەو نهێنییەی ئاشکرا کردبێت و مەتەڵی بەدیهاتنی شی کردبێتەوە و، کاملترین کەسێك بێت کە خەڵکی بۆ لای مەزنیی لایەنە جوانەکانی پەروەردگارێتیی خوا بانگ کردبێت: حەزرەتی محەممەدە ﷺ.. ئەوا بێ هیچ گومانێك لە نێوان هەموو گرۆی مرۆڤدا گەشت و گەڕان و سلووکێکی تایبەتی و مەعنەویی بەرزی بۆ دەستنیشان دەکرێت کە لە جیهانی ماددیدا لە شێوەی گەشت و گوزاردا بێت و، لە پشتی چینی بوونەوەران و بەرزەخی ناوەکان و درەوشانەوەی سیفات و کارەکانەوە چەندەها پلەی یەك لە دوای یەك دەبڕێت کە بە "حەفتا هەزار پەردە" ناو دەبرێن.

"میعراج" بریتییە لەمە.

❑ هەروەها بە خەیاڵدا دێت کە:

تۆی گوێبیست لە ناخی دڵتەوە دەڵێیت:

چ واتایەك لەوەدا هەیە کە: دوای بڕینی ماوەی هەزاران ساڵ و تێپەڕبوون لە حەفتا هەزار پەردەوە ئامادەی حوزووری ئەو خواوەندە ببێت کە لەچاو هەموو شتێکی تر لە ئێمەوە نزیکترە؟ چۆن باوەڕ بەمە بکەم؟

ئێمەش دەڵێین:

خوای گەورە بۆ هەموو شتێك لە هەموو شتێك نزیکترە، بەڵام هەموو شتێك بە دووریەکی ڕەها لەو خواوەندەوە دوورن!

گریمان "خۆر" خاوەنی هەست و شعوور و گوفتار بێت، ئەوا دەتوانێت بەو ئاوێنەیەی کە لەناو دەستتدایە قسەت لەگەڵدا بکات و هەر هەڵسوکەوتێکی مەبەست بێت لە تۆدا ئەنجامی بدات. جا لە کاتێکدا کە خۆر لە بیلبیلەی ئاوێنەئاسای چاوتەوە لێت نزیکترە، کەچی هەر لەو کاتەدا تۆ نزیکەی چوار هەزار ساڵ ڕێ لە خۆرەوە دووریت و، هەرگیز ناتوانیت بە هیچ شێوەیەك توخنی بکەویت و لێی نزیك ببیتەوە، تەنانەت گەر بۆ مەقامی مانگیش بەرز ببیتەوە و، بڕۆیتە خاڵێکی بەرامبەری ڕاستەوخۆی خۆرەوە، هێشتا جگە لە شتێکی وەك "ئاوێنەی وێنەدەرەوەی خۆر" چیی تر دەرناکەویت و هیچی ترت دەست ناکەوێت!

خۆری ئەزەل و ئەبەدیش کە خواوەندی گەورەیە – ولله المثل الأعلى – بە هەمان جۆرە، بۆ هەموو شتێك لە هەموو شتێك نزیکترە، هەرچەندە هەموو شتێك بە چەشنێکی ڕەها لە خواوەندەوە دوورە. مەگەر کەسێك چینەکانی سەرجەمی بوونەوەران – یەك لە دوای یەك – ببڕێت و، لە "هەندەکیتی" دەرباز ببێت و بە ناو یەك‌بەیەکی پلە "هەمەکی‌یەکان"دا سەربکەوێت و، بە ناو هەزاران پەردەدا بڕوات و، لە یەکێکی ئەو ناوانە نزیك بێتەوە کە دەوری هەموو بوونەوەرانیان داوە.. بەم جۆرە، گەلێ پلەی زۆر و زەبەندە لە بەردەم خۆیدا ببڕێت، ئنجا بە جۆرێك لە جۆرەکانی "نزیکی" شەرەفمەند ببێت.

نموونەیەکی تر: هەموو تاکە سەربازێك لە کەسایەتیی مەعنەویی سەرکردەی هەرە مەزن و گشتیی سوپاوە تابڵێی دوورە و، لە ماوەیەکی یەکجار دوور و لە پشتی چەندین پەردەی مەعنەویی زۆرەوە بۆ ئەو سەرکردەیەی دەڕوانێت و، بە نموونەیەکی بچووك لە پلەی عەریفەکەی‌دا دەیبینێت..

بەڵام بۆ نزیکبوونەوەی ڕاستەقینەی لە کەسایەتیی مەعنەویی سەرکردەی مەزنەوە، دەبێ بە چەندین پلەی هەمەکیی زۆری وەك پلەی مولازم و نەقیب و ڕائید و... هتد..دا گوزەر بکات، لە کاتێکدا کە سەرکردەی مەزن لای ئامادەیە و لە ڕێی فەرمان و یاسا و چاودێریی دانست و زانستەکەیەوە ئەم دەبینێت و، گەر لە جیهانی مەعنا و ڕۆحیشدا سەرکردە بێت ئەوا بە زاتی خۆیشی ئامادەی لای ئەو سەربازە دەبێت، هەروەك بە شێوە و ڕواڵەت لە لای ئامادەیە.

لەبەر ئەوەی لە وتەی شازدەهەمدا – بە چەشنێکی بێ‌گومان – ئەم ڕاستی‌یە چەسپێنراوە، ئەوا لێرەدا بەم ئەندازە کورتە واز دەهێنین.

❑ هەروەها دێت بە خەیاڵدا کە تۆ لە ناخی دڵتەوە دەڵێیت:

من ئینكاریی بوونی "ئاسمانەكان" دەكەم و باوەڕم بە "مەلائیكەت" نییە، ئیتر چۆن باوەڕ بە گەشت و گەڕانی مرۆڤێك بە ناو ئاسمانەكاندا و دیداری لەگەڵ مەلائیكەتەكاندا، دەكەم؟

بەڵێ، تێگەیاندنی كارێك و پیشاندانی شتێك بۆ كەسێكی وەك تۆ كە پەردە بەسەر چاویدا درابێت و ژیریشی دابەزیبێتە چاوی و جگە لە مادده چیی‌تر نەبینێت، كارێكی گەلێ سەخت و دژوارە. بەڵام "ڕاستی" هێندە خاوێن و ڕوونە كە تەنانەت كوێرەكانیش دەیبینن. بۆیە دەڵێین:

قسەی هەموان لەوەدا یەكانگیر بووە كە بۆشایی لای سەرووومان(الفضاء) پڕە لە "أثـــیر" چونكە ڕووناكی و، كارەبا و، گەرمی و، شلە ناسك و نیان و بە خورەمەكانی تری هاوچەشنیان، بەڵگەن لەسەر بوونی: "مادده"یەك كە بۆشایی پڕ كردووەتەوە.

جا هەروەك بەروبوومەكان بەڵگەی بوونی درەختەكانیان و، گوڵەكانیش باخچەكان دەچەسپێنن و، گوڵەگەنمەكانیش بەڵگەی كێڵگەكانیان و، ماسی‌یەكانیش بە ڕوونی و ئاشكرا دەبن بە بەڵگە لەسەر دەریاكانیان.. ئەم ئەستێرانەش، بە زەرووورەت و بەداهەت، بەڵگەن لەسەر بوونی باخچە و شوێنی سەرهەڵدان و كێڵگە و دەریاكانیان.

ئنجا مادەم جیهانی "عولْوی" بە چەند شكڵ و شێوەیەكی جۆراوجۆر بنیات نراوە و، هەریەكەیان لە ناوەندی چەند بارودۆخێكی جیاوازدا چەندین حوكمی جیاجیا دەردەخات، ئەوا شوێنی سەرهەڵدانی ئەو حوكمانەش - كە ئاسمانەكانن - بە هەمان جۆر جیاوازن و لە یەكتری جیان، چونكە هەروەك مرۆڤ جگە لە لەشی ماددی، چەندین جۆری "بوون"ی تری مەعنەویی هەیە وەك: ژیری و، دڵ و، گیان و، ئەندێشە و، حافیظـە و، غەیری ئەمانەش.. "جیهان"یش بە هەمان جۆرە، كە لە شێوەی مرۆڤێكی گەورەتردایە و، "بوونەوەران"یش - كە ئەو درەختەیە بەری مرۆڤی گرتووە - جگە لە جیهانی جیسمانی(ماددی) گەلێ جیهانی تری تێدایە. ئەمە وێڕای ئەوەی كە هەریەك لەو جیهانانە خاوەنی ئاسمانی خۆیەتی، هەر لە جیهانی زەوی‌یەوە تا دەگاتە جیهانی بەهەشت.

سەبارەت بە مەلائیكەتیشەوە دەڵێین:

لە كاتێكدا زەوی، كە لە هەسارە مامناوەندی‌یەكانە و لەچاو ئەستێرەكانیشدا چڕ و بچووكە، پڕ بێت لە چەندین جۆری لەژمارەبەدەری "ژیان" و "هەست و شعوور" كە بەنرخترین و درەخشانترین بوونەوەرن.. ئایا دەبێ سەبارەت بە ژیان و هەست و شعوورەوە ئاسمانەكان چۆن بن؟ كە بریتین لە چەند دەریایەكی فراوان بۆ مەلە تێداكردنی ئەو ئەستێرانەی كە وەك باڵەخانەی ڕازاوە و كۆشك و تەلاری گەردنكەش وان لەچاو ئەو زەوی‌یەی كە وەك ماڵێكی تاریكی بچووك وایە؟

کەواتە ئاسمانەکان چەندین ڕەگەزی جۆراوجۆری لەژمارەبەدەریان لـە خـاوەن هەسـت و خاوەن ژیانەکان تێدایە، کە مەلائیکەت و ڕۆحانی‌یانن.

جا لەبەر ئەوەی لە تەفسیرەکەماندا کە ناوی: "إشارات الإعجاز في مظان الإيجـاز"ە، لـە دەمی تەفسیرکردنی ئایەتی: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ﴾دا (البقرة:٢٩) بـە چەشنێکی بێ‌گومان "بـوون" و "فرەیی"ی ئاسمانـەکانمان چەسپاندووە و، لـە وتـەی بیسـت و نۆهەمیشدا بە جۆرێك کە گومان توخنی نەکەوێت بوونی مەلائیکەتمان چەسپاند، ئەوا لێرەدا بە کورتی لەم باسە دواین و درێژە پێدانیان بەو دوو پەیامە دەسپێرین.

**بە کورتی:**

"بوون"ی ئاسمانەکان کە لە "أثـــير" دروسـت کـراون و ڕێچکـە و مەسـاری: کارەبـا و، ڕوونـــاکی و، گـەرمی و، جازیبییـەت و، شـــلە ناسـك و نیانـــە بـــە خورەمـــەکانی تـــری هاوچەشنیانن و، لـەبار و شیاون بـۆ جموجوولـی ئەستێرەکان و هەسـارە گەڕۆکـەکان، وەك فەرمـوودەی پیرۆز بە: "السماءُ موجٌ مكفوفٌ"[1] ئامـاژەی بۆ کردووە.. ئەم ئاسمانانە هەر لە ڕێـی کاکێشـانەوە (کـە بـە گەلەستێرەی ئاسمـان نـاو دەبرێـت) تـا دەگاتـە نزیکـترین هەسـارە لێمانەوە، چەند بارودۆخێکی جیاجیا و چەند شکڵ و شێوەیەکی جۆراوجۆریـان لـە حـەوت چین(طبقة)دا لەخۆ گرتووە کە هەر یەکەیان لە حوکمی بنمیچێکدایە بۆ جیهانێکی تر، هـەر لە جیهانی زەوی‌یەوە تا جیهانی بەرزەخ و جیهانی میسال و تا جیهانی دواڕۆژ.. حیکمەت و مەنتیقی ژیری داخوازی ئەمەن.

❑ هەروەها دێت بە خەیاڵدا کە تۆی موڵحید دەڵێیت:

ئێمە گەلـێ بە سەختی دەتوانین بە فڕۆکە بـۆ بەرزایی‌یـەکان سـەربکەوین و زۆر بـە گرانـی دەگەینە ماوەی چەند کیلۆمەترێك، ئایا چۆن دەگونجێ مرۆڤێـك هـەر بـە جەسـتەی خـۆی لـە چەند خولەکێکدا ماوەی هەزاران ساڵ ببڕێت و پاشان بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی؟!

ئێمەش دەڵێین:

تەنێکی قورسی وەك گۆی زەوی، بەپێی ئەو زانیاری‌یانەی بە دەستتان هێناوە، لـە بزووتنـە ساڵانەکەی‌دا و لـە مـاوەی یـەك خولـەکدا قۆنـاغێك دەبڕێـت کـە نزیکـەی سـەد و هەشـتا و هەشت سەعات ڕێ‌یە، واتە زەوی لە یەك ساڵدا ماوەی بیست و پێنج هەزار ساڵ دەبڕێت..

(١) جزء من حديث أخرجه الإمام أحمد في مسنده (٢/٣٧٠) والترمذي برقم (٣٢٩٨) وفي تحفة الأحوذي برقـم (٣٣٥٢) وقال: هذا حديث غريب من هذا الوجه. وعزاه صاحب التحفة لأحمد وابن أبي حاتم والبزار وفي مجمـع الزوائد (٨/١٣٢) جزء من حديث رواه الطبراني في الأوسط، وفيه أبو جعفر الرازي وثقه حاتم وغـيره وضعفـه النسائي وغيره، وبقية رجاله ثقات. وانظر فيه كذلك (٧/١٢١) وتفسير ابن كثير - سورة الحديد. (وەرگێڕ - لـە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

جا ئه‌و خاوه‌ن توانـا شكۆمه‌نده‌ی كـه بـه‌م جموجـوولّ و بزووتنـه رێكوپێـك و وردانـه ئـه‌م زه‌وی‌یه زه‌به‌لاحه به‌ڕێ ده‌خات و ده‌یجوولّێنێت.. ئایا ناتوانێت مرۆڤێـك بـۆ عـه‌رش بـبـات؟..
ئایا ئه‌و دانسته‌ی كه به یاسایه‌كی په‌روه‌ردگاری - كه ناوی جازیبیه‌تی خۆری لـێ نراوه - به وێنه‌ی موریدی ته‌ریقـه‌تی مه‌ولـه‌وی ئـه‌م زه‌وی‌یـه قورسـه ده‌خاتـه گـه‌ڕ، ئایـا نـاتوانێت بـه جـازیبه‌ی سـۆز و میـهری خـواوه‌ندی میهـره‌بان و كێش‌بوونـی خـۆشـه‌ویسـتیی نـووری ئاسـمانه‌كان و زه‌وی، بـه وێنـه‌ی هـه‌وره بروسـكه، جه‌سته‌ی مرۆڤێـك بـبـات بـۆ عه‌رشـی خواوه‌ندی میهره‌بان؟

❑ هه‌روه‌ها دێت به خه‌یالّدا كه تۆ ده‌لّێیت:

وا دابنـێ ده‌توانێـت سـه‌ربكه‌وێت و بـۆ ئاسمـان بـه‌رز ببێتـه‌وه.. بـه‌لام ئایـا بۆچـی بـه‌رز ده‌كـرێتـه‌وه و چ پێویستی‌یه‌ك به‌م به‌رزبوونه‌وه‌یه هه‌یه؟ ئایا هێنده‌ی سه‌روزیاد نـه‌بوو كـه وه‌ك ئه‌ولیا پیاوچاكه‌كان ته‌نها به "دلّ" و "گیان" به‌رز ببوایه‌ته‌وه؟

ئێمه‌ش ده‌لّێین:

مادەم كردگاری مه‌زن ویستوویه‌تی نیشانه مه‌زنه‌كانی له‌ناو مولك و مه‌له‌كووتی خـۆی‌دا پێش‌چـاوی پێغه‌مبـه‌ر ﷺ بخـات و سـه‌رچاوه و كارگـه‌كانی ئـه‌م جیهانـه و، ئه‌نجامـه قیامه‌تی‌یه‌كانی كرده‌وه‌كانی مرۆڤیشی پیشان بدات.. ئه‌وا بێ هیچ گومانێك له‌گه‌لّ زاتی ئه‌و پێغه‌مبـه‌ره‌دا ﷺ هه‌سـتی بینینه‌كه‌شـی ده‌بـات كـه لـه حـوكـمتی كلیلـی جیهـانی بینـراواندایه و، هه‌ستی بیستنیشی ده‌كات به هاوده‌م تاكو به هۆیـه‌وه ئاگاداری نیشـانه‌كانی خواوه‌نـد ببێـت لـه جیـهانی بیسـراواندا، هـه‌روه‌ك ژیـری و حیكمـه‌ت داخـوازی ئـه‌وه‌ن كـه جه‌سته‌ی موباره‌كیشی له‌گه‌لّدا ببات بۆ عـه‌رش، ئه‌و جه‌سـته‌یه‌ی كه لـه حوكمی مه‌كینـه‌ی چه‌ندین ئامێر و ده‌زگای ئه‌وتۆدایه كـه كـار و ئه‌ركـه له‌سنووربه‌ده‌ره‌كانی "گیـان"ی ئـه‌ویان له‌سه‌ر به‌نده. چونكه هه‌روه‌ك دانستی خوای گـه‌وره لـه به‌هه‌شتدا لـه‌ش ده‌كات بـه هـاوڕێی گیـان، له‌بـه‌ر ئـه‌و ئه‌ركـه زۆرانـه‌ی به‌ندایـه‌تی كـه لـه ئه‌ستۆی لـه‌ش ده‌نرێن و ئـه‌و لـه‌زه‌ت و ئازارانه‌ش دێنه ڕێی، ئه‌وا ده‌بێ "جه‌سته"ی موباره‌كی ئه‌ویش له‌و گه‌شته‌دا هاوڕێی "گیـان"ی بێت. جا هه‌روه‌ك لـه‌ش له‌گـه‌لّ گیـاندا ده‌چێتـه به‌هه‌شـت، ئـه‌وا كـارێكی سـه‌رتاپا حیكمه‌تـه جه‌سته پیرۆزه‌كه‌شی هاوده‌می ئه‌و زاتی محه‌مه‌دی‌یه بێت ﷺ كه بۆ ئه‌و "سدرة المنتهى"یه بـه‌رز كراوه‌ته‌وه كه جه‌سته‌ی "جنة المأوى"یه.

❑ هه‌روه‌ها دێت به خه‌یالّدا كه تۆ ده‌لّێیت:

"ژیری" بڕینی ماوه‌یه‌كی هه‌زار سالّیی له چه‌ند خوله‌كێكدا به‌لاوه مه‌حالّه.

ئێمه‌ش ده‌لّێین:

جموجووڵی ئەو شتانەی کە کردگاری مەزن بەدیی هێناون تابلێی لە یەکتری جیاوازە. بۆ نموونە مەودای جیاوازیی خێرایی: دەنگ و، ڕووناکی و، کارەبا و، گیان و، ئەندێشە، ئاشکرایە لامان. ئنجا وەك زانست بۆی چەسپاندووین خێرایی هەسارەکانیش هێندە جیاجیایە کە ژێری تووشی سەرسامی دەکات. کەواتە چۆن جموجووڵی لەشی ناسك و نیانی پێغەمبەر ﷺ کە بەم میعراجە خێرایی بەدەست هێناوە و شوێن گیانە بەرزەکەی کەوتووە و بە ئەندازەی خێرایی گیان خێرا بووە، بە پێچەوانەی ژێری دادەنرێت؟

خۆ ئەگەر تۆ "دە" خولەك بخەویت ئەوا تووشی هێندە حاڵەت و بارودۆخی وا دەبیت کە لە ماوەی ساڵێکی حاڵی بێداریدا تووشیان نابیت، تەنانەت ئەو شتانەی کە مرۆڤ بۆ ماوەی یەك خولەك لە خەوندا دەیانبینێت و ئەو گوفتارانەش دەیانبیستێت و دەیانڵێت گەر لە جیهانی بێداریدا کۆ بکرێنەوە پێویستیان بە ماوەی ڕۆژێك یان زیاتر دەبێت.

کەواتە دەگونجێ تەنها یەك "زەمان" سەبارەت بە دوو کەسەوە بۆ یەکێکیان لە حوکمی یەك ڕۆژدا و بۆ ئەوی تریشیان لە حوکمی ساڵێکی ڕەبەقدا بێت.

به چاویلکەی ئەو نموونەیەی خوارەوە بۆ ئەم واتایە بڕوانە:

وا دابنێ "کاتژمێر"ێك هەبێت بۆ پێوانەی خێرایی جووڵەی: مرۆڤ و، گوللە و، دەنگ و، ڕووناکی و، کارەبا و، گیان و، ئەندێشە. ئەم کاتژمێرەش چەند میلێکی بۆ کرابێت: میلێکیان سەعات بژمێرێت و، یەکێکی تریان لە بازنەیەکی شەست ئەوەندەی بازنەی میلی یەکەمدا خولەکەکان بژمێرێت و، میلێکی تر لە بازنەیەکی شەست هێندە لەمە فراوانتر "ثانية"كان بژمێرێت و، یەکێکی تر لە بازنەیەکی شەست ئەوەندەی ئەمە فراوانتردا "ثالثة"كان بژمێرێت.. بەم چەشنە میلەکانی ژماردنی: "رابعة" و "خامســـــة" و هەروەها تا دەگاتە: "عاشرة". واتە ئەو سەعاتە چەند میلێکی سەرسووڕهێنەری ببێت کە هەریەکەیان لە بازنەیەکی شەست ئەوەندە فراوانتری میلەکەی پێش خۆیدا بخولێتەوە.

جا ئەگەر بازنەی ئەو میلەی کە سەعات دەژمێرێت بە ئەندازەی کاتژمێرە دەستییە بچووکەکانمان بێت، دەبێ بازنەی میلی "عاشـــرة"ژمێر بە ئەندازەی سووڕگەی ساڵانەی زەوی یان لەوە گەورەتر بێت!

ئنجا با ئێستا وا دابنێین کە دوو کەس هەن:

یەکێکیان: سواری میلی سەعات ژمێر بووە و سەیری دەوروبەری خۆی دەکات.

ئەویتریان: سواری میلی "عاشرة" ژمێر بووە و بۆ دەوروبەری خۆی دەڕوانێت.

جیاوازیی نێوان ئەو شتانەی کە ئەم دوو کەسە لە یەك "زەمان"دا دەیانبینن بە ڕێژەی جیاوازیی کاتژمێرە دەستییەکانمان و سووڕگەی ساڵانەی زەوییە! واتە جیاوازییان یەکجار زۆر دەبێت.

جا ئه‌و حوكمه‌ی بۆ جووڵه هه‌یه بۆ زه‌مانیش هه‌یه. چونكه له كاتێكدا كه ئێمه له ماوه‌ی یه‌ك كاتژمێردا به ئه‌ندازه‌ی ئه‌و شتانه ده‌بینین كه سواربووه خاوه‌ن هه‌سته‌كه‌ی میلی سه‌عات‌ژمێره‌كه بینیوونی و حه‌قیقه‌تی تەمه‌نیشی هه‌ر به هه‌مان ئه‌ندازه‌یه، پێغه‌مبه‌ری مه‌زنیش ﷺ به وێنه‌ی سواربووی میلی "عاشیره" ژمێره‌كه له هه‌مان كاتی سه‌عاته دیاری كراوه‌كه‌دا سواری بوراقی ته‌وفیقی خوایی ده‌بێت و، وه‌ك به‌رق(بروسكه) هه‌موو بازنه‌كانی "مومكینات"(به‌دیهاتووان) ده‌بڕێت و، نیشانه‌كانی مولك و مه‌له‌كووت ده‌بینێت و، بۆ خاڵی بازنه‌ی "وجووب" به‌رز ده‌بێته‌وه و، به دیدار و گوفتار و بینینی جوانیی خواوه‌ند شه‌ره‌فمه‌ند و به‌هره‌وه‌ر ده‌بێت و، په‌یمان و فه‌رمانی خوای گه‌وره بۆ ئه‌نجامدانی ئه‌ركێك وه‌رده‌گرێت و، پاشان ده‌گه‌ڕێته‌وه.. هه‌روه‌ك گه‌ڕایه‌وه و له ڕاستی و واقیعیشدا هه‌روا بووه و ڕووی داوه.

☐ هه‌روه‌ها دێت به خه‌یاڵدا كه ئێوه ده‌ڵێن:

به‌ڵێ دروسته و له‌وانه‌یه ڕوو بدات، به‌ڵام هه‌ر شتێك بگونجێ ڕوو بدات مه‌رج نی‌یه له ڕاستی و واقیعدا ڕوو بدات و بێته دی! كه‌واته چۆن ده‌كرێت بڕیار له‌سه‌ر شتێك ده‌ربكرێت كه وێنه‌ی نه‌بێت، ته‌نها به گریمانی ئه‌وه‌ی كه ده‌گونجێ ڕوو بدات؟

ئێمه‌ش ده‌ڵێین:

هاووێنه‌ی میعراج ئه‌وه‌نده زۆره له ژماره نایه‌ت، ئه‌وه‌تا بۆ نموونه هه‌موو كه‌سێك – كه توانای ڕوانینی هه‌بێت – له ماوه‌ی یه‌ك چركه‌دا ڕوانینی خۆی له زه‌وی‌یه‌وه بۆ هه‌ساره‌ی "نیبتۆن" به‌رز ده‌كاته‌وه و..

هه‌موو زانایه‌كیش به ژیری‌یه‌كه‌ی سواری یاساكانی گه‌ردوونناسی ده‌بێت و له ماوه‌ی یه‌ك خوله‌كدا ده‌گاته ئه‌ولای هه‌ساره و ئه‌ستێره‌كانه‌وه و..

هه‌موو ئیماندارێكیش بیری خۆی سواری هه‌ڵسوكه‌وت و ڕوكنه‌كانی نوێژ ده‌كات و، بوونه‌وه‌ران له پشتی خۆیه‌وه به‌جێ ده‌هێڵێت و، به شێوه میعراجێك ده‌ڕواته حوزووری خوای گه‌وره..

هه‌موو خاوه‌ن دڵ و وه‌لی‌یه‌كی كامڵیش ده‌توانێت له ماوه‌ی چل ڕۆژدا، به سه‌یر و سلووك، به عه‌رش و ناو بازنه‌ی سیفه‌ت و ناوه‌كاندا بڕوات و تێپه‌ڕ ببێت. ته‌نانه‌ت شێخی گه‌یلانی و ئیمامی ڕه‌ببانی و گه‌وره ئه‌ولیاكانی هاوچه‌شنیان – خوایان لێ ڕازی بێت – له ماوه‌ی یه‌ك خوله‌كدا به‌رزبوونه‌وه‌ی ڕۆحی‌یان به‌ره‌و عه‌رش به‌ده‌ست هێناوه، هه‌روه‌ك به چه‌ندین ڕیوایه‌تی ڕاست ئه‌م هه‌واڵه ڕاده‌گه‌یه‌نن..

هه‌روه‌ها مه‌لائیكه‌تانیش، كه چه‌ند له‌شێكی نوورانین، له كاتێكی یه‌كجار كه‌مدا له عه‌رشه‌وه بۆ فه‌رش و له فه‌رشه‌وه بۆ عه‌رش دێن و ده‌ڕۆن و..

ئەهلی بەهەشتیش، لە ماوەیەکی گەلێ کورتدا، لە مەیدانی مەحشەرەوە بۆ باخچەکانی بەهەشت، سەردەکەون.

ئەم ئەندازەیە لەم نموونە زۆرانە، بە چەشنێکی بێ گومان، دەری دەخەن کە: پادشای گشت ئەولیا و پێغەمبەران، علیهم السلام و، پێشەوای هەموو ئیمانداران و، سەرداری سەرجەمی ئەهلی بەهەشت و، وەرگیراوی سەرانسەری مەلائیکەتان، کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویست و بەرێزەیە ﷺ، بێ هیچ گومانێك بەو میعراجەدا سەردەکەوێت کە خولگەی سەیر و سلووکی ئەوە بۆ لای خوای گەورە، بە چەشنێك کە شایانی پلەی بەرزی ئەو بێت.

حیکمەت هەر ئەمەیە و، بەلای ژیرییەوە تابلێی ڕەوایە و، بێ هیچ گومانێکیش لە ڕاستی و واقیعدا ڕووی داوە.

# بناغەی سێهەم

## حیکمەتی میعراج چییە؟

**وەڵام:**

حیکمەتی میعراج هێندە بەرزە کە "بیر"ی مرۆڤ لە پەی پێبردنیدا دەستەوسانە و.. ئەوەندەش قووڵە کە پێی ناگات و.. هێندەش ورد و نیانە کە "ژیری" بە تەنها خۆی ناتوانێت بیبینێت..

بەڵام هەرچەند هەستکردن و پەی بردنی تەواوەتی بە ڕاستییەکانی ئەم حیکمەتە لە توانادا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا دەگونجێ لە ڕێی چەند ئاماژەیەکەوە بوونی ئەو دانستە بزانرێت، ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

بەدیهێنەری بوونەوەران و پەروەردگاری سەرجەمی جیهانەکان بۆ ئەوەی نووری "تاکی" و درەوشانەوەی "تەنیایی"ی خۆی لەناو چینەکانی بوونەوەراندا دەربخات، یەك کەسی خاوەن تایبەتکاری و دیار هەڵدەبژێرێت، لە ڕێی "میعراج"ێکەوە کە وەك تاڵە دەزوویەکی پەیوەندیدەر وایە لە نێوان ئەوپەڕی چینەکانی "زۆری"ی بوونەوەرانەوە هەتا دەگاتە سەرەتای "تاکی"ی خواوەند. بەم کارەش ئەو تەنیا کەسە هەڵبژاردەیە دەگەیەنێتە ئەو پلەیەی کە وەك نوێنەرێکی سەرجەمی بەدیهاتووان خوای گەورە گوفتاری خۆی ئاراستە بکات و، بە وێنەی نمایندەی گشت خاوەن هەستانیش ئامانجە خواییەکانی فێر بکات و پاشان بیکات بە مامۆستای ئەوان و لە ڕێی ئەم نوێنەرەوە ئەوانیش فێر بکات، تاکو لە لایەکەوە ئەو بەدیهێنەرە هەر بۆ خۆی جوانیی سەنعەت و کەماڵی پەروەردگارێتییەکەی لە

ئاوێنەی بەدیهاتووانی‌دا ببینێت و، لە لایەکی تریشەوە شوێنەوارەکانی ئەو جوانی و کەماڵە پێش‌چاوی غەیری خۆیشی بخات تا ئەوانیش ببینن.

چونکە مادەم خواوەندی پەروەردگاری هەموو جیهانەکان، بە شایەتیی ئاسەوار و بەدیهاتووەکانی، خاوەنی "جوانی" و "کەماڵ"ی ڕەهایە و، جوانی و کەماڵیش لە خۆیاندا دوو شتی خۆشەویستن، ئەوا - بێ هیچ گومانێك - خاوەنی ئەو جوانی و کەماڵە، لەڕادەبەدەر جوانی و کەماڵی خۆی خۆش دەوێت و، بە چەند شێوە و جۆرێکی زۆر و زەبەندەش ئەو خۆشەویستی‌یەی بۆ جوانی و کەماڵەکەی لەناو بەدیهاتووانی‌دا دەردەخات و، لەم ڕێیەوە بەدیهاتووانی خۆیشی خۆش دەوێت، چونکە ئاسەواری جوانی و کەماڵی خۆی لەواندا دەبینێت..

پاشان لەبەر ئەوەی: لە نێوان بەدیهاتووانی‌دا زیندەوەرانی لە هەموان خۆشتر دەوێت و پلەی بەرزتری پێ‌داون و.. لە نێوان زیندەوەرانیشدا خاوەن هەستانی پتر خۆش دەوێت و پلەی بەرزتری پێ ڕەوا بینیون و.. لە ڕووی جەم‌بوونی گشت توانا و لێهاتنەکانەوە خۆشەویست‌ترینی خاوەن هەستانیش لە نێوان گرۆی مرۆڤدایە.. ئەوا خۆشەویست‌ترین مرۆڤ بەلایەوە: ئەو کەسەیە کە سەرجەمی توانا و لێهاتنەکانی بە تەواوی بەرجەستە بوون و، نموونەکانی ئەو کەمالاتانەی خواوەندیشی بە تەواوەتی دەرخستووە کە بەسەر بەدیهاتووانیەوە دەدرەوشێنەوە.

جا بۆ ئەوەی بەدیهێنەری بوونەوەران گشت جۆرەکانی درەوشانەوەی ئەو خۆشەویستی‌یەی بۆ جوانی و کەماڵی خۆی کە لە هەموو بوونەوەراندا دەردەکەون، لە هەموو ئاوێنە و خاڵێکدا ببینێت و.. هەروەها بۆ ئەوەش کە بەهۆی نهێنیی "ئەحەدییەت"ەوە هەموو جۆرەکانی جوانیی خۆی دەربخات، ئەوا بۆ ئەم مەبەستە، کەسێکی ئەوتۆی هەڵبژاردووە کە بەروبوومی ڕووناکی درەختی بەدیهاتووانە و "دڵ"یشی لە حوکمی ناوکێکی وەهادایە کە دەتوانێت پەی بە سەرانسەری ڕاستی‌یەکانی ئەو درەختە سەرەکی‌یە ببات و بیانقۆزێتەوە.. بەڵێ، ئەو کەسەی لە ڕێی میعراجێکەوە هەڵبژاردووە کە بە وێنەی تاڵە دەزوویەکی پەیوەندیدەری نوورانی وایە لە نێوان ناوك و درەختەکەدا، واتە لە سەرەتاوە تا کۆتایی. بەم کارەش "خۆش ویستراوی"ی ئەو تاکە کەسە هەڵکەوتووەی لە بەردەم بوونەوەراندا ئاشکرا کردووە و، بەم میعراجە بۆ مەقامی حوزووری خۆی سەری خستووە و، بە بینینی جوانیی خۆی شەرەفمەندی کردووە و، بە فەرمان پێدانی خۆیشی ڕێزی لێ ناوە و، ئەرکێکی ئەوتۆی پێ سپاردووە کە ئەو دانستە خاوێن و بەرزەی لای ئەو دایناوە بە کەسانی تری غەیری ئەویشی بگەیەنێت.

وا لە ناوەندی دوو نموونەدا سەیری ئەم دانستە خواییی‌یە دەکەین:

☐ **نموونەی یەکەم:** ئەوەیە کە بە دریژی لە وتەی یازدەهەمدا ڕوونمان کردووەتەوە، کە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

ئەگەر پادشایەکی مەزن گەلێ گەنجینەی زۆری هەبێت کە پڕ بن لە چەندین جۆری لەژمارەبەدەری گەوهەری بەنرخ و ئەڵماسی بێ وێنە، ئنجا خۆیشی کارامەییی‌یەکی لەرادەبەدەری لە سنعەتە ناوازەکاندا بێت و شارەزایی‌یەکی گشتگیر و فراوانیشی لە چەندەها هونەری سەرسووڕهێنی لەژمارەبەدەردا هەبێت و خاوەنی ئاگاداری‌یەکی هەمەلایەنەی بێ سنوور و زانینێکی تەواوی چەندین زانستی ناوازە بێت.. ئەوا بێ گومان ئەو پادشا خاوەن هونەر و داهێنانە ناوازانە (وەك هەموو خاوەن جوانی و کەماڵێك کە حەز دەکات جوانی و کەماڵەکەی خۆی ببینێت و پیشانی غەیری خۆیشی بدات) دەیەوێت پیشانگایەکی گشتی بکاتەوە کە شتە بەنرخەکانی ناو گەنجینەکانی خۆی تێدا پێش‌چاو بخات، تاکو سەرنجی خەڵکی بۆ بینینی مەزنیی دەسەڵاتداری‌یەکەی ڕابکێشێت و، مەودای سەروەت و سامان و.. دەراسایی سنعەت و.. لایەنە سەرسووڕهێنەکانی شارەزایی‌یە کارامەکەی خۆی‌یان پیشان بدات، بۆ ئەوەی لە دوو ڕووەوە جوانی و کەماڵە مەعنەوی‌یەکانی خۆی ببینێت:

ڕووی یەکەم: بە ڕوانینی وردبین و تیژی خۆی.

دووهەم: بە چاوی غەیری خۆیشی.

جا لەسەر بناغەی ئەم دانستە، ئەم پادشا مەزنە، بێ هیچ گومانێك، کۆشکێکی گەورەی فراوان و بەسام و شکۆ بنیات دەنێت و، لێهاتووانە بە چەند فەرمانگە و نهۆم ومەنزڵێکی گەورە گەورە دابەشی دەکات و، هەریەك لەو بەشانەش بە گەوهەر و مرواریی ناو گەنجینە جۆراوجۆرەکانی ئارایشت دەدات و، بە جوانترین و نیانترینی ئەو بەدیهاتووە ناوازانەی کە بە دەستی سنعەتی خۆی دایهێناون دەیانڕازێنێتەوە و، بە وردترینی وردەکاری‌یەکانی دانایی و هونەرەکانی خۆیشی ڕێکیان دەخات. ئنجا چەندین سفرە و خوانی پڕ و فراوان ڕادەخات و بۆ هەر دەستە و تاقمێك ئەو خواردەمەنی‌یە دادەنێت کە شیاوی بێت و لەگەڵی‌دا بگونجێت. بەمەش میوانداری‌یەکی گشتی و سەخاوەتمەندانەی ئەوتۆ ئامادە دەکات کە پڕ بێت لە هەموو جۆرێکی نیعمەتەکانی و گشت خواردەمەنی‌یە بەتام و لەزەتە هەمە چەشنەکان.

پاشان بانگهێشتی هەموو ڕەعییەت و دانیشتووانی وڵاتەکەی دەکات بۆ ئامادەبوونی ئەم میوانداری‌یە سەخاوەتمەندانەیە و بینینی کەماڵاتە ناوازەکانی، ئنجا یەکێکیان بە نێرراوی

نێوان خۆی و ئەوان هەڵدەبژێرێت و بۆ لای خۆی بانگی دەكات و، بە ناو هەموو چینەكاندا - هەر لە نزمترینەوە تا بەرزترینیان - دەیبات و، فەرمانگە لە دوای فەرمانگە و چین لەسەر چین دەیگێڕێت و، یەك بەیەكی كارگەكانی ئ ‌‌‌‌ەو سنعەتە ناوازانە و گەنجینەكانی ئەو داهاتانەشی پیشان دەدات كە لە چینەكانی خوارەوە دێن، هەتا دەیگەیەنێتە فەرمانگە تایبەتی‌یەكەی خۆی و، لەوێ بە وەرگرتنی لە حوزووری خۆیدا شەرەفمەندی دەكات و، زاتی پیرۆزی خۆیشی - كە ئەسڵ و بناغەی هەموو كەماڵاتێكە - پیشان دەدات. ئیتر لەوێ كەماڵاتە زاتی‌یەكانی خۆی تێ‌دەگەیەنێت و بۆ ڕاستی‌یەكانی ئەو كۆشكەش ڕێنمایی دەكات و، ئەركی ڕابەرایەتی و ڕێ پیشاندەریی دەخاتە ئەستۆ بۆ سەیركەرانی پیشانگاكەی و، دەینێرێت بۆ لایان تاكو لە ڕێی نەخش و نیگار و لایەنە سەرسووڕهێنەكانی سنعەتی ئەو كۆشكەوە سنعەتكار و بنیاتنەری كۆشكەكە بەو خەڵكە بناسێنێت و، هێماكانی ناو نەخش و نیگارەكان و ئاماژەكانی ناو ئەو سنعەتانەیان تێ‌بگەیەنێت و، ئامادەبووانی ناو كۆشك شارەزا بكات لەوەی كە ئایا ئەم ئارایشتە ڕێك و نەخشونیگارە هاوسەنگانە چین و چۆن دەبن بە بەڵگەی كەماڵات و داهێنانە ناوازەكانی خاوەنی كۆشك؟ هەروەها بۆ ئەوەی شارەزای داب و ڕەویەی هاتوچۆ و سەیركردنی ناو كۆشكیان بكات و ئادابی ئامادەبوونیشیان لە بەردەم پادشای مەزندا تێ‌بگەیەنێت كە بە چاو نابینرێت.. هەموو ئەم كارانە بەپێی داخوازی و ڕەزامەندیی پادشا ئەنجام بدات.

بە وێنەی ئەم نموونەیە: كردگاری مەزنیش، كە پادشای ئەزەل و ئەبەدە - ولله المثل الأعلى - ویستوویەتی: "جوانی" و "كەماڵ"ی ڕەهای خۆی ببینێت و پیشانی غەیری خۆیشی بدات. بۆ ئەم مەبەستەش، كۆشكی جیهانی بە ناوازەترین شێوەی ئەوتۆ بنیات ناوە، كە هەموو بوونەوەرێكی ناو كۆشك بە چەندین زمانی زۆر باسی كەماڵاتی ئەو دەكەن و بە چەندەها ئاماژەی جۆراوجۆریش دەبن بە ڕێنما و بەڵگە لەسەر جوانی‌یەكانی، بە ڕادەیەك كە بوونەوەران - بە هەموو یەكێكیان - دەری دەخەن: چەندین گەنجینەی مەعنەوی لە ناوەندی هەموو یەكێك لە ناوە جوانەكانی خوای گەورەدا حەشار دراون و، لە نێوان هەموو ناونیشانێكی خاوێنی ئەویشدا چەندین لایەنی نەرمونیان داپۆشراون. تەنانەت ئەم بەڵگە و ڕێنمایی‌یەی بوونەوەران لەسەر ئەم ڕاستی‌یە هێندە ڕوون و ئاشكرایە كە هێشتا سەرجەمی هونەر و زانستەكانی مرۆڤ، بە هەموو یاسا و دەستوورەكانیانەوە، هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی لەسەر بێت - تا ئێستا، نەیانتوانیوە بگەنە سەرجەمی ئەو بەڵگە ناوازانەی كە لە كتێبی گەردووندان، لە كاتێكدا كە ئەو كتێبە هێشتا یەك لەسەر دەی واتاكانی ناوە جوانەكان و كەماڵاتە خوایی‌یەكانی دەرنەبڕیوە!

جا "حیكمەت"ی ئەو كردگارە شكۆمەندە خاوەن جوانی و كەماڵەی كە ئەم كۆشكە ناوازەیەی بە وێنەی پیشانگایەك بنیات ناوە بۆ بینین و پیشاندانی جوانی و كەماڵی مەعنەویی خۆی، داخوازی ئەوەیە كە: یەكێك لە خاوەن هەستانی زەوی لە واتای نیشانەكانی ئەو كۆشكە تێبگەیەنێت تاكو واتاكانی بێهوودە و بێسوود دەرنەچن و، بۆ جیهانە بەرزەكان سەری بخات كە سەرچاوەی لایەنە سەرسووڕهێنەرەكان و گەنجینەی داهاتەكانی ئەو كۆشكەن، ئنجا بۆ پلەیەكی هێندە بڵند بەرزی بكاتەوە كە لە سەرووی هەموو بوونەوەرانیەوە بێت و، بە نزیك خستنەوەشی لە حوزووری خۆی شەرەفمەندی بكات و، بە جیهانەكانی دواڕۆژدا بیگێڕێت و، چەند كارمەندی و ئەركێكی گرنگی پێ بسپێرێت تاكو ببێت بە: مامۆستای سەرتاسەری بەندەكانی و.. بۆ لای پادشایەتیی پەروەردگاریتییەكەی خۆی بانگیان بكات و.. ئەو كارمەندی و ئەركانەی پێ ڕابگەیەنێت كە مایەی ڕەزامەندیی خوایەتیی ئەون و.. ئایەتە تەكوینییەكانی ئەم كۆشكەیان بۆ تەفسیر بكات..

بەڵێ، ئەمانە و كارمەندییەكانی تری هاوچەشنی ئەمانەی پێ بسپێرێت، تاكو خوای گەورە لە ڕێیانەوە فەزڵ و پایەبەرزیی ئەم هەڵبژاردەیە بۆ هەموو جیهانەكانی دەربخات و، بە مەدالیای ئەو موعجیزاتانەش كە بە بەرۆكیدا هەڵی واسیون پلەی مەزنی ئەویان بۆ ئاشكرا بكات و، بە قورئانی پیرۆزیش تێیان بگەیەنێت كە ئەم هەڵبژاردەیە چەندە ڕاگەیەنەرێكی ڕاستگۆ و تەرجومانێكی ئەمینی دەست پاكە.

بەم چەشنە، لەبەر تیشكی ڕووناكیی ئەم نموونەیەدا چەند حیكمەتێكمان لە نێوان حیكمەتە زۆرەكانی میعراجدا ڕوون كردەوە. دەبێ تۆش پاشماوەی حیكمەتەكانی تر بەم پێیە قیاس بكەیت.

❑ **نموونەی دووهەم:**

ئەگەر كەسێكی "زانا" كتێبێكی خاوەن ئیعجازی ئەوتۆ دابنێت كە: هەموو لاپەڕەیەكی: ڕاستییەكانی سەد كتێبی تری تێدا كۆكرابێتەوە و، هەر دێڕێكیش: واتا ناسكەكانی سەد لاپەڕەی كتێبێكی تری لەخۆ گرتبێت و، هەموو وشەیەكیشی: ڕاستییەكانی سەد دێڕی تێدا بێت و، هەر پیتێكیشی: واتاكانی سەد وشە دەربرێت.. ئنجا سەرجەم واتا و ڕاستییەكانی ئەو كتێبەش ئاماژە بۆ كەمالاتی مەعنەویی دانەرە ناوازە و خاوەن ئیعجازەكەیان بكەن و ڕوویان لەو بێت..

بێ گومان دانەری كتێبی ئاوا پڕ لە ئیعجاز، كتێبە ئیعجاز بەخشەكەی خۆی، بێ سوود لێ وەرگرتن، پشت گوێ ناخات و دەرگای ئەم گەنجینە نەبڕاوەیەش داناخات، تەنانەت هەر

مەحاڵە بێهوودە لە کاری بخات. لەبەر ئەوە، چەند کەسێکی دیاری کراو لە واتاکانی کتێبەکەی تێدەگەیەنێت تاکو ئەو کتێبە بەنرخە بە بێ سوود نەمێنێتەوە و پشت گوێ نەخرێت و کەمالاتە پەنهانەکانی دەربکەون و جوانی‌یە مەعنەوی‌یەکەشی ببینرێت، بۆ ئەوەی خەڵکی خاوەنەکەی ئەو کتێبەیان خۆش بوێت و ئەو کتێبەش خاوەنەکەی لای خەڵکی خۆشەویست بکات. واتە یەك‌بەیەکی واتا و ڕاستی‌یەکانی فێری کەسێك دەکات و، وانە بە وانە و هەر لە یەکەم لاپەڕەوە تا کۆتایی کتێبەکەی بە دەرس پێ دەڵێتەوە و تێی‌دەگەیەنێت، تا لە ئەنجامدا بڕوانامەی پێ دەبەخشێت.

خواوەندی وێنەکێشی جوان و مەزنیش، بۆ ئەوەی: کەمالات و، جوانی و، ڕاستی‌یەکانی ناوە جوان و خاوێنەکانی خۆی بە چەشنێکی ناوازەی بێوێنە دەربخات، ئەم کتێبی بوونەوەرانەی نووسیوە! ئەوەتا هەموو یەکێك لە بوونەوەران، بە چەندەها ڕووی بێسنوور و لەژمارەبەدەر، دەبن بە ڕێنما و بەڵگە لەسەر: ناوە جوانەکان و، سیفەتە مەزنەکان و، کەمالاتە ڕەهاکانی خوای گەورە و، ئەو واتایانە دەردەبڕن!

شتێکی ئاشکرایە کە: هەر کتێبێکی ئاسایی گەر واتاکەی نەزانرێت، بێهوودە دەردەچێت و، نرخیشی بەرەو عەدەم دەکەوێتە خوار.. ئایا دەبێ کتێبێکی وەك ئەمە چۆن بێت کە هەموو پیتێکی هەزاران واتایان لەخۆ گرتووە؟ دیارە نرخ و بەهای ئەم چەشنە کتێبە هەرگیز ناگونجێت دابەزێتە خوار و بێهوودە و بێسوود لە دەست دەربچێت!

کەواتە نووسەری ئەم کتێبە خاوەن ئیعجازە، بە حەتمی کەسێك هەڵدەبژێرێت کە خاوەنی گشتی‌ترین ڕوانین و هەست و شعوور و، کامڵترین توانا و لێهاتن بێت، تاکو ئەو کتێبەی فێر بکات و، بەپێی ئامادەیی و لێهاتنی هەر تاقم و دەستەیەك، بەشێکی واتاکانی لێ تێ بگەیەنێت.

جا بۆ مەبەستی وتنەوەی وانەی ئەم چەشنە کتێبە بەو کەسە و، شارەزا کردن و تێگەیاندنی لە سەرجەمی ڕاستی‌یەکانی، بە شێوەیەکی هەمەکی و گشتی، "حیکمەت" داخوازی ئەوەیە کە: گەشت و گەڕانێکی لەوپەڕی بەرزی‌دا پێ بکات. واتە: دەبێ هەر لە دوا چینی بوونەوەرە زۆرەکانەوە – کە یەکەم لاپەڕەکانی ئەم کتێبەن – تا دەگاتە فەرمانگەی ئەحەدییەت – کە دوا لاپەڕەکانیەتی – بگەڕێت و یەك‌بەیەکیان ببینێت.

بەم جۆرە، دەتوانیت بۆ خۆت لە سایەی ئەم نموونەیەدا، شتێك لە حیکمەتە بەرزەکانی میعراج ببینیت.

* * *

ئێستاش ئاوڕ لەو مولحیدە دەدەینەوە کە لە گۆشەی گوێ بیستدا دانیشتووە و، گوێ لە دڵی ڕادەگرین با بزانین چ بارودۆخێکی لەخۆ گرتووە؟

❑ وا بە خەیاڵدا دێت کە دڵی ئەو مرۆڤە مولحیدە بڵێت:

خەریکم چەند هەنگاوێك لەسەر ڕێگەی ئیمان دەنێم.. بەڵام سێ گرفتم هەن سەریان لێ دەرناکەم و بۆم شی ناکرێنەوە..

یەکەم: بۆچی تەنها "محەممەد" ﷺ بەم میعراجە مەزنە تایبەتمەند کرا؟

دووهەم: چۆن ئەم پێغەمبەرە مەزنە ﷺ "ناوك"ی ئەم بوونەوەرانەیە؟ ئەوەتا لە لایەکەوە دەڵێن: بوونەوەران لە نووری ئەو بەدی هێنراون و، لە هەمان کاتیشدا دەڵێن: ڕووناکترین و دواهەمین بەروبوومی بوونەوەرانە! ئەم قسەیە چی دەگەیەنێت؟

سێهەم: لە ڕوونکردنەوەکانی پێشووتاندا دەڵێن: بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ جیهانە بەرزەکان لەبەر بینینی کارگە سەرەکییەکانی ئاسەوارەکانی ناو ئەم جیهانە و گەنجینە و عەمباری ئەنجامی ئاسەوارەکان بووە.. واتای ئەم قسەیە چییە؟

■ **گرفتی یەکەم:**

**وەڵام:**

ئەم گرفت و ئیشکالەی یەکەمتان، بە درێژی لە هەر سی و سێ وتەکەی کتێبی سۆزلەر (وتەکان)دا شی کراوەتەوە. بەڵام لێرەدا و بە پوختە پێرستێك سەبارەت بە کەماڵاتی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ و، بەڵگەکانی پێغەمبەرێتییەکەی و، دەرخستنی ئەوەی کە تەنها ئەم پێغەمبەرە ﷺ شایانی ئەم میعراجە بەرزەیە، ئاماژەیەکی پوخت پێش چاو دەخەین.

یەکەم: کتێبە پیرۆزەکانی وەك تەورات و ئینجیل و زەبوور، چەندین ئاماژە و مزگێنییان سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ تێدایە، هەرچەندەش بە درێژایی مێژوو دەستکاری کراون. لەم چەرخەی خۆماندا زانای لێکۆڵەر: "حسین الجسر" سەد و دە مزگێنیی لەو کتێبانە دەرهێناوە و، لە کتێبەکەیدا کە ناوی: "الرسالة الحميدية"یە تۆماری کردوون.

دووهەم: بەپێی هەواڵی "مێژوو" هەروەها بە گەلێ ڕیوایەتی صەحیح، چەندین مزگێنیی زۆری کاهینەکان چەسپاوە. وەك ئەو دوو کاهینە بەناوبانگەی کە ناویان (شیق) و (سەتیح)ە و، پێش ناردنی پێغەمبەر ﷺ مزگێنییان داوە و هەواڵی هاتنی پێغەمبەری ئاخر زەمانیان ڕاگەیاندووە.

سێهەم: ئەو ڕووداوانەی لە شەوی لەدایکبوونیدا ڕوویان داوە، وەك: ڕووخانی بتەکانی ناو کەعبە و، ڕووخانی هەیوانی کیسرا و، سەدان ئیرهاص و ڕووداوی لە عادەت بەدەری تری وەك ئەمانە، کە تەواو بەناوبانگن و "کتێبەکانی مێژوو" باسیان کردوون.

چـوارەم: هـەڵقـوڵانی ئـاو لە نێوان پەنجـە پیرۆزەكانی و تێراوكـردنی سوپا لەو ئـاوەو، تاسـەو گریان وناڵەی بنەدارەكەی ناو مزگەوت و، لەت بوونی مـانگ، وەك دەقی ئایـەتی: ﴿وانْشَـقَّ الْقَمَـر﴾ دەری بریـوە و، چـەندین موعجیزەی تری وەك ئەمانـە كـە لـە لای زانـا لێكۆڵـەرەكان چەسپاون و هـەزار موعجیزەی وەهـا دەبن و، كتێبـەكانی بەسـەرهاتی ژیـانی پێغەمبەر ﷺ و مێژوو تۆماریان كردوون.

پێنجەم: هەموو دۆستان و دوژمنان، بە جۆرێكی بێ گومان، لـەوەدا یـەكیان گرتـووە كـە: ئەو ڕەوشتە جوانانەی لە پێغەمبەردان ﷺ لە بەرزترین پلەدان و، ئـەو سیفەتە باشـانەی كـە لـە بانگەوازەكـەی‌دا هـەن لـە ئاستێكی گەلـێ بڵنـددان و، هەڵسوكەوتیشـی لەگـەڵ خـەڵكی‌دا باشترین شایەتە لەسەر ئەمە. شـەریعەتە پـاك و بێ گەردەكەشـی كامڵـترین ڕەوشـتی بـەرزی لـە خۆدا كۆكردووەتەوە، هەروەك بەرزی و شكۆمەندیی ئایینەكەی شایەتە لەسەری.

شەشەم: لە ئاماژەی دووهـەمی وتەی دەهەمدا ئاماژەمان بۆ ئەوە كردووە كە:

زاتی پیرۆزی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە بوو ﷺ كە بۆ جێ‌بەجێ كردنـی ویسـتی خـوا لـە بـارەی پیشاندانی خوایەتیی خوای گەورە و بەپێی خواستی حیكمـەتی ئـەو خوایـە، بـەو بەندایەتی‌یـە گەورەیەی كە لە ئایینەكەیدایە، بەرزترین پلەكانی "بەندایەتی"ی پیشان دا.

هەروەها وەك شتێكی بەڵگەنەویستە هەر تەنها ئـەو پێغەمبەرەیـە ﷺ كـە بـەڕێزترین ڕابـەر و ڕێ پیشاندەرە بۆ جوانیی كەماڵی ڕەهای بەدیهێنەری جیهان و، باشترین و بەرزترین پێناسەرە كـە بـەدەم بـانگی ئـەو ویستەی خـواوە ڕۆشـتووە سـەبارەت بـە دەرخسـتن و پیشـاندانی ئـەو جوانی‌یە لە ڕێی نێرراوێكەوە، وەك "ڕاستی" و "دانایی" داخوازی ئەمەن.

هەروەها، وەك شتێكی لەبەرچاو و بینراوە، هـەر ئـەو پێغەمبەرەیـە ﷺ كـە گـەورەترین ڕێ پیشـاندەرە و شـارەزای كـەماڵی سنعەتی بەدیهێنـەری جیهانـە، ئـەو كەماڵـەی كـە لەوپـەڕی جوانیی ڕەهادایە، ئەم ڕێنماییی‌یەشـی بەوپـەڕی گـەورەیی دەرخسـتووە و بـە زوڵاڵـترین دەنـگ ڕایگەیاندووە. بەم كارەشـی بـە دەم ویسـتی خـوای گـەورەوە ڕۆشتووە و سـەرنجی دنیـای بـۆ كەماڵی سنعەتی خواوەند ڕاكێشاوە و خەڵكی لـێ ئاگادار كردووەتەوە.

هەروەها، وەك شتێكی پێویستە، هەر تەنها ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ كە كامڵترین كەسێك بێـت هەموو پلەكانی "تەوحید"ی بە خەڵك ڕاگەیاندبێت و بەم پێ‌یە، بە دەم ویستی پـەروەردگاری هـەموو جیهانەكانـەوە ڕۆشتبێـت و، "یـەكتایی" خواوەنـدی بەسـەر هـەموو چینـە زۆرەكـانی بەدیهێنراواندا ئاشكرا كردبێت.

هـەروەها، وەك شتێكی پێویسـتە، هـەر ئـەو پێغەمبەرەیـە ﷺ كـە سـافترین و ڕوونـاكـترین ئاوێنەیـە بـۆ پیشـاندان و ڕەنگدانـەوەی جوانكاری‌یـەكانی جوانیـی خـاوەنی جیـهان و

وردەکاری‌یەکانی جوانی‌یە بێ وێنە و بەرزەکەی، وەك ئەو شایەتی‌یەی کە ئاسەوارە بێ وێنەکانی دەستەڵاتی ئەو دەیدەن لەسەری. هەروەها ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەرزترین و چاکترین کەسێکە خواوەند خۆشی ویستبێت و لە لای غەیری خۆیشی خۆشەویستی کردبێت. پێغەمبەریش ﷺ بەدەم ویستی خواوەندەوە ڕۆشت لەوەدا کە ئەو جوانی‌یە بەرز و پیرۆزەی خواوەندی دی و، بەپێی داخوازیی "حەقیقەت" و "حیکمەت" پیشانی غەیری خۆیشی دا.

هەروەها وەك شتێکی بەڵگەنەویستە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ مەزنترین کەسێك بێت کە هەر شتێك لە گەنجینە پەنهانەکانی بەدیهێنەری جیهاندایە، بە جیهانی ناساندبێت، ئەو گەنجینانەی کە بە ناوازەترین موعجیزە و بەنرخترین گەوهەر پڕ کراون. ئەم پێغەمبەرە ﷺ گەورەترین و بەرزترین کەسە کە ئەمەی ئاشکرا کردووە و دەری خستووە و وەسفی کردووە. بەم کارەشی بە دەم ویستی خواوەندەوە ڕۆشتووە لەوەدا کە دەیەوێت ئەم گەنجینە شاراوانە دەربخات و ئاشکرایان بکات.

هەروەها، وەك شتێکی بەڵگەنەویستە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە کامڵترین ڕابەر بێت بۆ جینی و ئادەمیزاد، تەنانەت بۆ ڕۆحانی و مەلائیکەتانیش.. هەر تەنها ئەو مەزنترین کەسێکە واتای ئاسەوار و جێدەستەکانی بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرانەی ڕوون کردبێتەوە، کە بە جوانترین ئارایشتکاری ڕازاندوونیەتەوە و، دەرفەتی بە خاوەن هەستانی ناو بەدیهێنراوانیشی داوە کە بە بیرکردنەوە و پەند لێ وەرگرتن سەرنجی بدەن. بەمەش ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەدەم ئەو ویستەی خواوەندەوە ڕۆشتووە کە دەیەوێت واتای ئەو ئاسەوارانەی سنعەتی خۆی و دەستنیشان کردنی نرخیان بۆ ئەهلی بینین و بیرکردنەوە ڕوون بکاتەوە.

هەروەها وەك شتێکی ئاشکرا و بەڵگەنەویستە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە باشترین کەسێك بێت، لە ڕێی ڕاستی‌یەکانی قورئانەوە، ناوەرۆکی ئەو "ئامانجە"ی ئاشکرا کردبێت کە لە ئاڵوگۆڕەکانی بوونەوەراندا هەن و، هەر ئەویشە کە مەتەڵ و گرێ‌کوێرەی سەرسووڕهێنەری گەردوونی حەل کردبێت و کردبێتیەوە، کە بریتی‌یە لە سێ پرسیارە سەختەکەی : (تۆ کێیت؟.. لە کوێوە هاتوویت؟.. بۆ کوێ دەڕۆیت)؟! بەمەش ئەو ویستەی خوای گەورەی جێبەجێ کرد کە دەیویست ئەو نهێنی و گرێ‌کوێرەیە بەهۆی نێرراوێکی خۆیەوە بۆ خاوەن هەستان دەربخات و بیکاتەوە.

هەروەها، وەك شتێکی ئاشکرا و بەڵگەنەویستە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە کامڵترین کەسێك بوو بێت بەهۆی قورئانی پیرۆزەوە، ئامانجەکانی خوای گەورەی دەرخستبێت و، هەر ئەویشە ئەو ڕێگایەی ڕوون کردبێتەوە کە مرۆڤ دەگەیەنێتە ڕەزامەندیی پەروەردگار. بەمەش ئەو ویستەی خواوەندی بەجێ‌هێنا کە دەیویست بەهۆی نێرراوێکی خۆیەوە ڕوونی بکاتەوە

كه‌: چیی له‌ خاوه‌ن هه‌ستان ده‌وێت و به‌ چی لێیـان ڕازی ده‌بێـت، دوای ئـه‌وه‌ی كـه‌ لـه‌ ڕێـی به‌دیهێنراوه‌ بێ وێنـه‌ و ناوازه‌كانیـه‌وه‌ خـۆی پێ ناسـاندن و، بـه‌ نیعمـه‌ت و به‌خشـشه‌ بـه‌رز و به‌نرخ و له‌ ژماره‌ به‌ده‌ره‌كانیشی خۆی له‌ لا خۆشه‌ویست كردن.

هـه‌روه‌ها، وه‌ك شتێكی ئاشـكرا و به‌ڵگه‌نه‌ویسته‌، هـه‌ر ئـه‌و پێغه‌مبه‌ره‌یـه‌ ﷺ كـه‌ بـه‌هۆی قورئـانی پـیرۆزه‌وه‌، مـه‌زنترین كه‌سێك بێـت ئه‌ركی پێغه‌مبه‌رایـه‌تیی بـه‌ تـه‌واوی جێ‌بـه‌جێ كردبێـت و، له‌ به‌رزترین پله‌ و جوانترین و ڕێكترین شێوه‌دا و به‌وپـه‌ڕی باشـی ڕایگـه‌یاندبێت. به‌مـه‌ش بـه‌ده‌م ئـه‌و ویسـته‌ی پـه‌روه‌ردگاره‌وه‌ ڕۆشـت كـه‌ ده‌یویسـت ڕووی مـرۆڤ لــه‌ "زۆری"یه‌وه‌ به‌ره‌و "یه‌ك" و، له‌ "فانی"یه‌وه‌ به‌ره‌و "باقی" وه‌ربگێڕێت..

ئـه‌و مرۆڤـه‌ی كـه‌ خـواوه‌ندی به‌دیهێنـه‌ر كـردوویه‌تی به‌ به‌روبوومی جیهان و.. هێنـده‌ش تـوانـا و لێهاتنی پێ به‌خشیوه‌ كـه‌ جێـی هـه‌موو جیـهانی تێـدا ببێتـه‌وه‌ و.. بۆ به‌ندایه‌تی‌یـه‌كی گشتی ئاماده‌ی كردووه‌ و.. به‌ چه‌ند هه‌ست و شعوورێكیش تاقیی كردووه‌ته‌وه‌ كه‌ ڕوویان له‌ "زۆری" و "دنیا"یه‌..

جـا له‌بـه‌ر ئـه‌وه‌ی كــه‌ بــه‌رزترین پلــه‌ی بوونــه‌وه‌ران: زینده‌وه‌رانــن و.. بــه‌رزترینی زینده‌وه‌رانیـش: خـاوه‌ن هه‌سـتانن و.. بـه‌ڕێزترینی خـاوه‌ن هه‌سـتانیش: مرۆڤــه‌ ڕاســت و كامڵه‌كانن.. ئه‌وا له‌به‌ر هه‌موو ئه‌مانه‌، ئه‌و كه‌سه‌ی كـه‌ لـه‌ نێـوان هـه‌موو مرۆڤـه‌ بـه‌ڕێزه‌كاندا ئـه‌و فه‌رمانبه‌ری‌یه‌ ناوبراوانه‌ی ئه‌نجام داوه‌ و، به‌ شـێوه‌یه‌كی جـوان و پله‌یـه‌كی بـه‌رز مـافی خۆیانی پێ داون.. به‌ بێ هیـچ گومـانێك ئه‌و مرۆڤه‌ به‌هۆی میعراجی مه‌زنه‌وه‌ بۆ به‌رزترین پله‌ی وه‌ك: (قاب قوسین أو أدنی) بـه‌رز ده‌كرێتـه‌وه‌ و، لـه‌ ده‌رگـای به‌ختـه‌وه‌ریی هه‌میشـه‌یی ده‌دات و، ده‌رگــای گه‌نجینــه‌كانی میــهره‌بانیی فراوانــی خـواوه‌نـد ده‌كاتــه‌وه‌ و، ڕاســتی‌یه‌ په‌نهانه‌كانی ئیمان به‌ بینینی چاو ده‌بینێت..

جا ده‌بێ ئه‌و كه‌سه‌ كێ بێت جگه‌ له‌و پێغه‌مبه‌ره‌ به‌ڕێزه‌ ﷺ ؟

حه‌وته‌م: هه‌ر كه‌سێك سـه‌رنجی خـۆی ئاراسته‌ی ئه‌م به‌دیـهێنراوه‌ پـه‌رش و بڵاوانـه‌ی نـاو گه‌ردوون بكـات، بـه‌ حـه‌تمی جوانكـاری و ئارایشـتكاریی لـه‌ ئه‌ندازه‌به‌ده‌ر و ناوازه‌یـان تێـدا ده‌بینێت. خۆ شتێكی ئاشكرایشه‌ كه‌ ئه‌م جوانكاری و ئارایشتانه‌ به‌ڵگـه‌ن له‌سـه‌ر ئـه‌وه‌ی كـه‌ به‌دیهێنه‌ری ئه‌و به‌دیهێنراوانه‌ ویستی له‌سه‌ر جوانكاری و ئارایشتدانی ئه‌و به‌دیهێنراوانه‌یـه‌تی، جا ئه‌و ویسته‌ توندوتیژه‌ی ئه‌و - به‌ بێ هیچ گومانێك - ده‌بێت به‌ به‌ڵگه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌و به‌دیهێنــه‌ره‌ حــه‌زێكی بــه‌رز و خــاوێن و خۆشه‌ویســتی‌یه‌كی پــیرۆزی لــه‌ به‌رامبــه‌ر ئــه‌و به‌دیهێنراوانه‌ی خۆیه‌وه‌ هه‌یه‌..

له‌بـه‌ر ئـه‌وه‌، شـتێكی ئاشـكرا و به‌ڵگه‌نه‌ویسـته‌ كـه‌: خۆشه‌ویسـت‌ترین كـه‌س لـه‌ لای ئـه‌و به‌دیهێنه‌ره‌ی كه‌ به‌دیهێنراوانی خۆی خۆش ده‌وێت، ئه‌و كه‌سـه‌یه‌ كـه‌ هـه‌موو ئـه‌و سیفه‌تانه‌ی

تێدا جەم بوو بێت و، لە خودی خۆیشیدا وردەکاریەکانی سنعەتی خواوەند بە جوانی و تەواوی دەربخات و بیانزانێت و بە غەیری خۆیشیانی بناسێنێت.. کەسێك بێت کە خۆی لای خوای گەورە خۆشەویست بکات و، بەوپەڕی رێز و سەرسوورمانەوە دان بە جوانیی بوونەوەرانی تردا بنێت و، ئەو جوانیيانەیان دەربخات.

جا ئەو کەسە کێیە کە بەرامبەر ئەو جوانکاری و وردەکاری و کەمالاتەی کە بوونەوەران جوان دەکەن و دەیانڕازێننەوە و ڕووناکیيان تێدا پەخش دەکەن، وای لە زەوی و ئاسمانان کردبێت کە بە زایەڵەی دەنگی: (سبحان الله.. ماشاء الله.. الله اکبر) و، بە (زیکر و تەسبیحات و الله أکبر) کردنی سەرسوورمانەوە، دەنگ بدەنەوە؟

ئەو کەسە کێیە کە بە ئاوازی قورئانی پیرۆز سەرانسەری بوونەوەرانی ڕاتەکاندووە و، وشکایی و دەریاکانیشی خستووەتە جۆش و خرۆشێکی تابلێی توندوتیژەوە و شەوق و تاسەیەکی یەکجار زۆریشی بەرامبەر بەو قورئانە پیرۆزەوە تێدا هەژاندوون و، وای لێ کردوون کە ڕێزلێنان و سەرسوورمانی خۆیان بەرامبەر جوانیی ئەو قورئانە بە بیرکردنەوە و ئاشکراکردن و، بە زیکر و تەهلیلەوە دەرببڕن؟ دەبێ ئەو زاتە پیرۆزەی کە ئەم کارانە ئەنجام دەدات کێ بێت جگە لە حەزرەتی محەممەدی ئەمین ﷺ؟

جا پێغەمبەرێکی ئاوا مەزن ﷺ کە بەهۆی نهێنیی: "السبب كالفاعل"ەوە هەردەم بە ئەندازەی ئەو کردەوە چاکانەی نەتەوەکەی کردوویانە و دەیکەن، کردەوەی چاك دەخرێتە سەر تای تەرازووی کردەوە چاکەکانی.. ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە سەرجەمی ئەو سڵاواتانەی نەتەوەکەی لەسەری دەدەن، دەخرێنە سەر کەمالاتە مەعنەوییەکانی.. ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە هێندە میهرەبانی و خۆشەویستیی خواوەندی بەسەردا دەبارێت کە نەتوانرێت سنووری بۆ دیاری بکرێت، سەرەڕای ئەو بەروبوومانەش کە پاداشتی گەورە و مەعنەوین و هی بەئەنجامگەیاندنی ئەرکی پێغەمبەرایەتین..

بەڵێ، ڕۆیشتنی پێغەمبەرێکی گەورەی ئاوا ﷺ - بە بێ هیچ گومانێك - بۆ بەهەشت و "سدرة المنتهى" و "قاب قوسين أو أدنى": عەینی حەق و ڕاستییە و، سەرتاپا دانستی خواوەندە و، کارێکە هیچ گومانێکی تێدا نییە.

■ **گرفتی دووهەم:**

ئەی مرۆڤی دانیشتوو لە پلەی گوێبیستدا! ئەم ڕاستییەی کە تۆ لێت بووە بە گیروگرفت، لە خۆیدا گەلێ قووڵە و، هێندەش بەرزە کە ژیری پێی ناگات و تەنانەت نزیکیشی ناکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا بە نووری ئیمان دەبینرێت.

ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین، لە ڕێی چەند نموونەیەکی یاریدەدەر و بەم چەشنەی خوارەوە، شتێك لەو ڕاستییە بەرزە لە تێگەیشتنەکانەوە نزیك بخەینەوە:

ئه‌گه‌ر به‌ چاوی "دانایی" سه‌یری ئه‌م بوونه‌وه‌رانه‌ بكرێت، ئه‌وا له‌ واتا و شێوه‌ی دره‌ختێكی مه‌زندا ده‌رده‌كه‌وێت، جا هه‌روه‌ك دره‌خت: په‌ل و گه‌لاَ و گوڵ و به‌ری هه‌یه‌، له‌ جیهانی نزمیشدا – كه‌ به‌شێكی دره‌ختی به‌دیهاتووانه‌ – ماكه‌كان(العناصر): وه‌ك په‌لی دره‌خت و، ڕووه‌ك و دره‌خته‌كانیش: له‌ حوكمی گه‌لاَدا و، زینده‌وه‌رانیش: به‌ وێنه‌ی گوڵه‌كانی و، مرۆڤه‌كانیش: به‌ چه‌شنی به‌روبوومه‌كانی دره‌ختی ئه‌و جیهانه‌ نزمه‌، ده‌رده‌كه‌ون.

ئه‌و یاسا خواییه‌ش كه‌ له‌ دره‌خته‌كاندا ده‌ست به‌كاره‌، ده‌بێ به‌پێی داخوازیی ناوی جوانی "الحكیم"ی خواوه‌ند، له‌م دره‌خته‌ مه‌زنه‌شدا ده‌ست به‌كار بێت. كه‌واته‌ "حیكمه‌ت" داخوازی ئه‌وه‌یه‌ ئه‌م دره‌خته‌ش له‌ ناوكێك په‌یدا بووبێت و، ئه‌م ناوكه‌ش، وێڕای له‌خۆگرتنی جیهانی جیسمانی، نموونه‌ و بناغه‌كانی سه‌رجه‌م جیهانه‌كانی تری له‌ خۆدا جه‌م كردبێت. چونكه‌ ئه‌و ناوكه‌ بناغه‌یی و سه‌ره‌كی‌یه‌ی بوونه‌وه‌ران، كه‌ هه‌زاران جیهانی له‌خۆ گرتووه‌ و جێی سه‌رهه‌ڵدانی ئه‌و جیهانانه‌یه‌، هه‌رگیز ناگونجێ ته‌نها مادده‌یه‌كی وشكی بێ گیان بێت.

ئنجا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی پێش ئه‌م دره‌خته‌ی بوونه‌وه‌ران دره‌ختێكی تری له‌ جۆری غه‌یری خۆی پێش نه‌كه‌وتووه‌، ئه‌وا ئه‌و واتا و نووره‌ی كه‌ له‌ حوكمی ناوكی ئه‌و دره‌خته‌دان، له‌ شێوه‌ی به‌رێكی دره‌ختی بوونه‌وه‌راندا به‌رجه‌سته‌ بووه‌ و پۆشاكی به‌روبوومی له‌به‌ر كراوه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ناوك هه‌میشه‌ ڕووت و قووت نابێت، چونكه‌ گه‌ر له‌ سه‌ره‌تای به‌دیهاتندا پۆشاكی "به‌ر" نه‌پۆشێت، له‌ كۆتاییدا ده‌یپۆشێت و له‌به‌ری ده‌كات!

مادده‌م مرۆڤ ئه‌و به‌روبوومه‌یه‌ و، باشترین و ڕووناكترین و جوانترین و مه‌زنترین و شه‌رمه‌ندترین و ناسكترین و به‌سوودترین به‌روبوومه‌كانی گرۆی مرۆڤیش – وه‌ك پێشتر بۆمان چه‌سپا – ئه‌و حه‌زره‌تی محه‌مه‌ده‌یه‌ ﷺ كه‌ به‌ فه‌زڵ و چاكه‌كاری‌یه‌كانی سه‌رنجی هه‌موو به‌دیهاتووانی ڕاكێشاوه‌ و، ڕوانینی نیوه‌ی گۆی زه‌وی و پێنج‌یه‌كی گرۆی مرۆڤایه‌تیی ئاراسته‌ی زاتی پیرۆزی خۆی كردووه‌ و، سه‌رنجی هه‌موو جیهانه‌كانی، به‌ خۆشه‌ویستی و ڕێز و قه‌درزانی‌یه‌وه‌، بۆ لای ڕه‌وشته‌ جوانه‌كانی خۆی ڕاكێشاوه‌.. ئه‌وا ده‌بێ ئه‌و نووره‌ی كه‌ ناوكی پێكهاتنی بوونه‌وه‌رانه‌ له‌ زاتی ئه‌ودا به‌رجه‌سته‌ ببێت و له‌ شێوه‌ی به‌روبوومی كۆتاییدا ده‌ربكه‌وێت.

ئه‌ی كاكی گوێبیست! به‌دیهێنانی ئه‌م بوونه‌وه‌ره‌ ناوازه‌ و مه‌زنه‌ له‌ ماهییه‌تێكی جوزئیی مرۆڤێك هه‌رگیز به‌ دوور مه‌زانه‌، چونكه‌ ئه‌و خاوه‌ن توانا شكۆمه‌نده‌ی دره‌ختێكی زه‌به‌لاحی سنه‌وبه‌ر – كه‌ وه‌ك جیهانێك وایه‌ له‌ خۆیدا – له‌ ناوكێكی بچووكی دره‌ختی سنه‌وبه‌ر به‌دی ده‌هێنێت، چۆن بوونه‌وه‌رانیش له‌ نووری حه‌زره‌تی محه‌مه‌د ﷺ به‌دی ناهێنێت؟ یان چۆن له‌ ئاستی ئه‌م كاره‌دا ده‌سته‌وسان ده‌بێت؟

بەڵێ، درەختی بوونەوەران وەك درەختی تووبای بەهەشت وایە، قەد و ڕەگەکانی بە ناخی جیهانی بەرزی "عولْوی"دا ڕۆچووە و پەل و بەرەکانیشی بەرەو جیهانی نزمی "سوفلی" شۆڕ بوونەتەوە. لەبەر ئەوە، تاڵە دەزوویەکی پەیوەندیی نوورانی لە نێوان هەردوو لادا هەیە، هەر لە مەقامی بەروبوومەکەوە لە خوارەوە تا دەگاتە مەقامی ناوکە سەرەکی‌یەکە لە سەرەوە.

جا میعراجی پێغەمبەر ﷺ: وێنە و بەرگی ئەو دەزووی پەیوەندی‌یە نوورانی‌یەیە. چونکە پێغەمبەری ئازیز ﷺ ئەو ڕێگایەی کردەوە و، بە ویلایەتەکەی پیای‌دا سەرکەوت و، بە پێغەمبەرایەتی‌یەکەشی گەڕایەوە. ئنجا ئەو دەرگایەشی بە کراوەیی هێشتەوە تاکو ئەولیاکانی نەتەوەکەی، کە بە "ڕۆح" و "دڵ" سلووك دەکەن و شوێنی ئەو دەکەون، بیگرنە بەر و لە ژێر سایەی میعراجی پێغەمبەردا ﷺ بەو شەقامە نوورانی‌یەدا بڕۆن و هەریەکەیان بەپێی توانا و لێهاتنی خۆیان بۆ چەندین مەقامی بڵند سەربکەون.

پێشتر چەسپاندمان کە: کردگاری مەزن لە پێناوی چەند مەبەست و ئامانجێکی گەورەدا ئەم بوونەوەرانەی بە وێنەی کۆشکێکی ناوازە بەدی هێناوە و ڕازاندوویەتەوە.. جا ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەی ﷺ کە خولگە و تەوەرەی ئەو مەبەست و ئامانجانەیە، دەبێ هەر لە پێش بەدیهێنانی بوونەوەرانەوە جێی عینایەت و چاودێریی خواوەند و یەکەم کەس بووبێت کە بە لێ درەوشانەوەی ئەو کردگارە مەزنە بەهرەمەند بووە.

کەواتە ئەو پێغەمبەرە مەزنە ﷺ "ئەووەڵ"ە لە ناوەرۆك و مەعنادا.. "ئاخر"یشە لە بوون و وجووددا!

لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ: کامڵترینی بەروبوومەکانی درەختی بەدیهاتووانە و، مایەی نرخ و بەهای هەموو بەروبوومەکانە و، تەوەرەی دەرکەوتنی سەرجەمی مەبەست و ئامانجەکانە.. ئەوا دەبێ نووری ئەو پێغەمبەرە ﷺ یەکەم بەدیهاتوو بێت کە درەوشانەوەی بەدیهێنان(إيجاد)ی بەدەست هێنابێت!

### ■ گرفتی سێهەم:

ئەم ڕاستی‌یە هێندە فراوانە کە زەینە بەشەری‌یە تەسکەکانمان ناتوانن بە تەواوەتی لێی تێبگەن و پەیی پێ ببەن، بەڵام دەتوانین لە دوورەوە بۆی بڕوانین.

بەڵێ، کارگە مەعنەوی‌یەکان و یاسا هەمەکی‌یەکانی جیهانی "سوفلی" لە جیهانی "عولْوی"دان.. هەروەها ئەنجامی کردارەکانی بەدیهاتووە لەژمارەبەدەرە نیشتەجێبووەکانی گۆی زەوی - کە لە خۆی‌دا مەحشەرێکە بۆ بەدیهاتووانی خوای گەورە - هەروەها داهات و بەروبوومی ئەو کارانەی کە جینی و ئادەمیزاد ئەنجامیان دەدەن، بە هەمان جۆر، تێکڕا لە جیهانە (عولـــوی)یەکاندا دەردەکەون و بەرجەستە دەبن.. تەنانەت ئاماژەکانی

قورئانی پیرۆز و، داخوازیی نـاوی جوانـی "الحكیـم"ی خواوەنـد و، ئـەو داناییـەی لـە توێـی بوونـەوەراندا حەشـار دراوە و، شـایەتیدانی ڕیوایەتـە زۆر و نیشـانە لـە سـنووربەدەرەكانیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە: كردەوە چاكەكان لەو جیهانانەدا لە شێوەی بەروبوومی بەهەشتدا دەردەكەون و، كردەوە خراپەكانیش شێوەی زەقوومی دۆزەخ دەگرنە خۆ.

بەڵێ، بوونەوەرە زۆرەكان – بە شێوەیەكی فراوان – لە ڕووی زەوی‌دا بڵاوبوونەتـەوە و، جۆرەكانی بەدیهاتنیش لەم سەرزەوییەدا گەلێ لق و پەلیان لـێ بووەتەوە، بە ڕادەیـەك كە ڕەگەز و جۆرەكانی ئەو بەدیهـاتووانەی بـەردەوام دەگـۆڕڕێن و گـۆی زەوییـان لـێ پڕ دەكـرێ و ئنجا لێیان خاڵی دەكرێتەوە، گەلێ زیاترن لەو بەدیهاتووانەی كـە لـە سـەرجەمی گەردووندا پەرش و بڵاون.

كەواتە سەرچاوە و كانگا سەرەكییەكانی ئـەم شتە جوزئی و بەدیـهاتووە زۆرانـە، دەبێ چەند یاسایەكی هەمەكی و درەوشانەوەی گشتیی ناوە جوانەكان بن، بە چەشـنێ كـە شـوێنی تیادەركەوتنی ئەو یاسا هەمەكی و درەوشانەوە گشتی و ناوە گشتگیرانە بریتین لە ئاسمانەكان، كە لە خۆیـاندا سـادە و سـاكار و تـا ڕادەیـەك سـاف و ڕوونـن و، هەریەكەشیان لـە حوكمـی عەرش و بنمیچی جیهانێكی تردان و مەڵبەندێكی هەڵسوكەوت تیـاكردنن. تەنانـەت یـەكێك لەو جیهانانە "جنة المأوى"یە كە لە لای "سدرة المنتهى"دایە.

هەواڵدەری ڕاستگۆ ﷺ بەم واتایە هەواڵێكی داوە كە: ئـەو تەسـبیحات و تەحمیدانـەی لـە زەوی‌دا دەكرێن، لەودنیا لە شێوەی بەروبوومەكانی بەهەشتدا بەرجەستە دەبن.

ئـەم سـێ خـاڵە، بۆمـان دەردەخـەن كـە: گەنجینـەی ئەنجـام و بەروبوومـەكانی زەوی لـەوێدان و داهاتەكانیشی بۆ ئەوێ دەبرێن.

كاكی گوێبیست!

هەرگیز مەڵێ: ئەو وشەی "الحمد لله"یەی لە هەوادا بـە دەم دەیڵێـم چـۆن لـە بەهەشـتدا بـە شێوەی بـەروبووم بەرجەستە دەبێـت؟ نـەخێر وا مـەڵێ.. چونكـە تـۆ كـە بـە ڕۆژ لـە كـاتی بێداری‌دا وشەیەكی خاوێنت لە زار دەردەچێت، هەندێ جار لە خـەوندا بە وێنـەی سێوێكی بەلـەزەت دەیبینیـت و دەیخۆیت. هـەروەها هـەندێ جـار گوفتـارە ناشـیرینەكەی ڕۆژت، لـە خەوندا وەك شتێكی تاڵ دەبینیت و قووتی دەدەیت، بۆ نموونە گەر بە ڕۆژ غەیبەتی كەسێكت كردبێت، لە خەوندا ناچاری خواردنی گۆشتی مردوو دەكرێیت!

كـەواتە ئەو وشـە جـوان و ناشـیرینانەی لـەم دنیایـەدا لـە زارت دەردەچـن – كـە جیـهانی خـەوە – لـە جیـهانی بێداریی ئەودنیا لـە شێوەی بـەروبوومدا پێشكەشـت دەكرێـن و تـۆش دەیانخۆیت. دەشبێ ئەم خواردنەت هەرگیز بە دوور نەزانیت!

# بناغەی چوارەم

## بەروبووم و سوودەکانی میعراج چین؟

**وەڵام:**

ئەم میعراجە مەزنەی کە درەختێکی تووبای مەعنەوی‌یە، گەلێ سوودی مەزن و بەروبوومی پێگەیشتووی هەیە، کە زیاتر لە پێنج‌سەد دانەیان بەو درەختەدا شۆڕ بوونەتەوە. بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها پێنجیان بۆ نموونە باس دەکەین..

### بەروبوومی یەکەم

بریتی‌یە لە: بینینی ڕاستی‌یەکانی پایەکانی ئیمان بە چاوی بینین و تێگەیشتن. واتە: بینینی مەلائیکەت و، بەهەشت و، ئاخیرەت، تەنانەت بینینی زاتی مەزنی شکۆمەندی خواوەندیش. جا ئەم چاوپێکەوتن و بینینە ڕاستە: گەنجینەیەکی مەزنی نەبڕاوە و، نوورێکی ئەزەلیی نەکوژاوە و، دیاری‌یەکی هەتاهەتایی لەڕادەبەدەر بەنرخی بە سەرجەمی بوونەوەران و بە تایبەتی گرۆی ئادەمیزاد بەخشیوە. چونکە ئەو "نوور"ە سەرجەمی بوونەوەرانی لەو وەهمە دەرباز کرد کە گومانی ئەوەیان پێ دەبرا و وا دەزانرا لەناو چەند بارودۆخێکی لەناوچووی شڵەژاوی بەئازاردا دەتلێنەوە و هەردەم بەرەو خوارتریش دادەبەزن.. بەڵێ، لەو گومانە دەری هێنان و بە شێوە ڕاستەقینەکەیان دەری‌خستن کە بریتین لە: چەند نووسراوێکی صەمەدانی و.. نامەی خاوێنی پەروەردگاری و.. چەند ئاوێنەیەکی جوان کە جوانیی "تەنیایی" خواوەندیان تێدا دەردەکەوێت. دیارە بەمەش خۆشی و شادیی خستە دڵی هەموو خاوەن هەستانەوە، تەنانەت هەموو بوونەوەرانی خۆشحاڵ و شادمان کرد.

ئنجا ئەو نوورە چۆن بوونەوەرانی لە چەند بارودۆخێکی وەهمی و ئازاربەخش دەرهێنا.. مرۆڤی دەستەوسانی بەردەم چەندەها دوژمنی لەژمارەبەدەر و موحتاجی چەندین پێویستیی بێ سنووریشی لە چەندەها بارودۆخی فانی و ڕێ لێ ونکەر ڕزگار کرد کە تیایاندا دەتلایەوە و، پەردەی لەسەر شێوە ڕاستەقینەکەی لادا و دەری خست کە "مرۆڤ": یەکێکە لە موعجیزاتی توانستی خوای گەورە و.. بەدیهاتووی "أحسن تقویم"یەتی و.. نوسخەیەکی گشتی و تیاجەم‌بووی نامە صەمەدانی‌یەکانی خواوەندە و.. قسە بۆکراوی خاوەن هەست و شعوور و بەندەی تایبەتیی پادشای ئەزەل و ئەبەدە و.. خەلیلی خۆش ویستراوی خۆی و نرخ شناسی کەماڵاتەکانیەتی و.. خۆشەویست و سەرسووڕماوی جوانیی خاوێنی خواوەندە و..

میوانی بەڕێز و پاڵێوراوی دەستنیشان کراویەتی بۆ بەهەشتە نەبڕاوە هەمیشەیی‌یەکەی.. ئای لەم نوورە چ خۆشی‌یەکی لەڕادەبەدەر و تاسەیەکی گەرموگوڕی نەبڕاوە پێشکەش بە هەموو کەسێك دەکات کە خۆی بە "مرۆڤ" بزانێت!

## بەروبوومی دووهەم

بریتی‌یە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ "بناغەکانی ئیسلام" لە پێش هەموویانەوە "نوێژ"ی وەك دیاری‌یەکی بەنرخ و باش و گرانبەها بۆ سەرانسەری گرۆی جینی و ئادەمیزاد لەگەڵ خۆی‌دا هێناوە، ئەو بناغانەی کە ڕەزامەندی‌یەکانی پەروەردگاری جیهانیان و فەرمانڕەوای ئەزەل و ئەبەدیان تێدا بەرجەستە بووە.

خۆ هەر تەنها "زانین"ی ئەو شتانەی مایەی ڕەزامەندیی پەروەردگارن، هێندە تاسەمەندی و حەز و ئارەزووی تێگەیشتن لە مرۆڤدا دەورووژێنێت کە لە باس کردن نایەن، وێڕای ئەو بەختەوەری و شادمانی‌یەش کە بە دڵی مرۆڤی دەبەخشێت. چونکە بێ گومان هەموو مرۆڤێك زۆر بە گەرموگوڕی و پڕ بەدڵ حەز دەکات بزانێت - با لە دووریشەوە بێت - ئەو پادشایەی کە نیعمەتی خۆی بێ‌بەخشیوە و چاکەی لەگەڵدا کردووە چیی لێ دەوێت و داوای چیی لێ دەکات؟ خۆ ئەگەر ڕەزامەندی‌یەکانی خواوەندیشی زانی، ئەوا دەکەوێتە خۆشی و شادمانی و ڕەزامەندی و دڵنیایی‌یەوە و پڕ بە دڵیش ئاوات دەخوازێت و دەڵێت: (خۆزگا هۆکارێك لە نێوان من و پەروەردگارمدا دەبوو تاکو بزانم چیی لە من دەوێت و پێی خۆشە لەسەر چ جۆرە حاڵەت و ڕەفتارێك بم)!

بەڵێ، ئەو مرۆڤەی کە لە هەموو کات و حاڵ و کاروبارێکی‌دا لەوپەڕی هەژاری و موحتاجی‌دایە بۆ لای خاوەنەکەی خۆی و.. هێندەش چاکە و نیعمەت و خەڵاتی ئەوی دەست کەوتووە کە لە ژمارە نایەن و.. دڵنیایە لەوەی کە سەرجەمی بوونەوەران لە دەستی ئاڵوگۆڕپێ کردن و توانستی ئەودان و.. هەرچی بریسکانەوەی جوانی و کەماڵاتیش هەن کە بەسەر ڕوخساری بوونەوەرانەوە دەردەکەون، هێشتا لەچاو جوانی و کەماڵی ئەودا سێبەرێکی لاوازن..

بەڵێ، ئەم مرۆڤە، دەبێ چەندە موشتاق و ئارەزوومەندی ناسینی ئەو شتانە بێت کە مایەی ڕەزامەندیی ئەو پەروەردگارە شکۆمەندەن و چەندەش حەز بکات بزانێت داوای چیی لێ دەکات! لەوانەیە بتوانیت بۆ خۆت ئەمە لێك بدەیتەوە و هەڵی بسەنگێنیت!

دەسا فەرموو ئەوەتا پێغەمبەری ئازیز ﷺ ئەو ڕەزامەندی‌یانەی پەروەردگاری جیهانیانی لەگەڵ خۆدا هێناوە و، بە "حق الیقین" لە پشت حەفتا هەزار پەردەوە ڕاستەوخۆ لە

خواوەندی بیستوون و، وەك یەكێك لە بەروبوومە خاوێن و بەلەزەتەكانی میعراج بە دیاری پێشکەشی سەرجەمی گرۆی مرۆڤایەتیی کردوون.

بەڵێ، مرۆڤ کە حەز دەکات بزانێت چی لەناو "مانگ"دا ڕوو دەدات و، گەر کەسێك بڕوات بۆ ناو مانگ و هەواڵی ئەویٚ بهێنێتەوە، لەوانەیە ئەم زۆر شتی بەنرخی خۆی بەخت بکات لە پێناوی زانینی ئەو هەواڵەدا و، هەتا هەواڵی زیاتری ئەویٚ بزانێت پتر سەرسامی و سەرسووڕمان دەیگرێت!

کاتیٚ ئەمە حاڵی مرۆڤ بێت لەگەڵ هەواڵەکانی ئەو کەسەی کە لە مانگەوە هاتووەتەوە، دەبیٚ شەوق و تاسەمەندیی مرۆڤ بۆ بیستنی هەواڵەکانی ئەو کەسە چۆن بێت کە لە لایەن ئەو خاوەن موڵکە شکۆمەندەوە گەڕاوەتەوە کە مانگ لە موڵکی ئەودا تەنها وەك مێشێك وایە بە دەوری پەپوولەیەکدا بفڕێت و ئەو پەپوولەیەش بە دەوری یەكێك لەو هەزاران چرایانەدا بخولێتەوە کە میوانخانەکەی ئەویان ڕووناك کردووەتەوە!

بەڵێ، پێغەمبەری ئازیز ﷺ کاروبار و سنعەتە ناوازە و گەنجینەکانی میهرەبانیی ئەم پادشا مەزن و شکۆمەندەی لە جیهانی مانەوە(بقاء)دا بینی و، دوای ئەوە گەڕایەوە و، بینینەکانی بۆ گرۆی ئادەمیزاد گێڕایەوە.

خۆ ئەگەر گرۆی مرۆڤ بە تاسە و ئارەزوومەندی و بەوپەڕی ڕێز و سەرسووڕمانەوە گویٚ لەم پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ ڕانەگرێت، ئەوا بزانە چەندە لە ژیری دوور دەکەوێتەوە و چەندەش بەم ڕەفتارەی لە دانایی لا دەدات!

## بەروبوومی سێهەم

بریتییە لەوەی کە: پێغەمبەر ﷺ گەنجینەکانی بەختەوەریی هەمیشەیی و نیعمەتە نەبڕاوەکانی بەهەشتی دیوە و، کلیلەکانیانی وەرگرتووە و بە دیاری بۆ گرۆی جینیی و ئادەمیزادی هێناوە!

بەڵێ، لەم میعراجەدا بە چاوی سەر بەهەشتی هەمیشەیی بینیوە و، درەوشانەوە هەمیشەیییەکانی سۆز و بەزەیی خواوەندی میهرەبانی شکۆمەندی دیوە و، بە "حق اليقين" بەختەوەریی هەمیشەیی هەست پێ کردووە و، مژدەی ئەو بەختەوەرییە هەمیشەییەشی لەگەڵ خۆیدا بۆ جینیی و ئادەمیزاد هێناوە، کە مژدەیەکی هێندە مەزنە مرۆڤ لە وەسف کردنیدا دەستەوسانە.

چونکە لە کاتێکدا بارودۆخە وەهمییەکان دەورانەوری جینیی و ئادەمیزادیان داوە و، وای پیشان دەدەن کە: هەموو بوونەوەران بەردەوام لەم دنیا بیٚبار و ڕانەوەستاوەدا

هەمیشە زللەی جودایی و نەمانیان لێ دەدرێت و، لافاوی زەمان و جموجوولی گەردیلەكانیش بەرەو دەریای عەدەم و جودایی هەمیشەیی ڕایدەماڵن.. بەڵێ، لە كاتێكدا ئەم بارودۆخە ئازار بەخشانەی - كە وەختە گیانی جینني و ئادەمیزاد بكێشن - لە هەموو لایەكەوە دەورەیان داون.. ئا لەم كاتەدا، ئەو مژدە خۆشەی بەختەوەریی هەمیشەییان پێ دەدرێت!

بۆ خۆت لەبەر تیشكی ئەمەدا مەودای ئەو بەختەوەری و شادمانی و دڵخۆشی‌یەی جینني و ئادەمیزاد لێك بدەرەوە كە لەم مژدەیەوە بەدەستی دەهێنن، لە كاتێكدا كە پێشتر لەو گومانەدا بوون بڕیاری ئیعدامی هەمیشەییان لەسەر دەركراوە و بە تەواوەتی تیادەچن و نامێنن. ئنجا دوای ئەم لێكدانەوەیە لە نرخ و بەهای ئەم مژدەیە تێ بگە.

گەر كەسێك حوكمی لەسێدارەدانی لەسەر دەركرابێت و، لەو كاتەدا كە بەرەو پەتی سێدارە هەنگاو دەنێت، پێی بوترێت: (پادشا لێت خۆش بووە و، جگە لەمەش خانوویەكی پێ بەخشیوویت)! دەبێ مەودای ئاسۆكانی ئەو خۆشی و شادمانی‌یە چەندە بێت كە ئەم هەواڵە لە دڵ و دەروونی ئەو كەسە بە ئیعدام حوكم دراوەدا دەیكاتەوە؟!

جا بۆ ئەوەی بتوانیت لە نرخ و بەهای ئەم بەروبووم و مژدە مەزنە تێ بگەیت و تەسەووری بكەیت، ئەوا بە ئەندازەی ژمارەی جینني و ئادەمیزاد ئەو خۆشی و شادمانی‌یە كۆبكەرەوە، با ئەندازە و مەودای نرخ و بەهای ئەو مژدەیەت بۆ دەربكەوێت!

## بەروبوومی چوارەم

بریتی‌یە لە بینینی جوانیی خوای گەورە. جا هەروەك پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی بەم بینینە بەهرەمەند بوو، ئەو هەواڵەشی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە كە: هەموو ئیمانداریك دەتوانێت بەم بەروبوومە باقی و نەبڕاوەیە بەهرەمەند ببێت!! بەمەش دیاری‌یەكی گەلێ مەزنی پێشكەشی گرۆی جینني و ئادەمیزاد كرد!

دەتوانیت بۆ خۆت لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەی خوارەوە مەودای چێژ و شیرینی و جوانی و بەنرخیی ئەم بەروبوومە بەدیاری هاتووە دەستنیشان بكەیت:

هەر مرۆڤێك دڵێكی زیندووی لە خۆیدا هەڵگرتبێت، بێ هیچ گومانێك ئەو كەسەی خۆش دەوێت كە خاوەنی جوانی و كەماڵ و چاكەیە.. ئنجا ئەم خۆشەویستی‌یەش هەردەم بەپێی بەرزبوونەوەی پلەكانی ئەو جوانی و كەماڵ و چاكەكاری‌یە زیاد دەكات و بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە پلەی عیشق و پەرستن. ئیتر خاوەنی ئەم پلەیە لە پێناوی بینینی ئەو جوانی‌یەدا هەرچی‌یەكی هەیە بەختی دەكات، تەنانەت لەوانەیە هەموو دنیاكەشی بەخت بكات لە پێناوی ئەوەی تەنها یەك جار ئەو جوانی‌یە ببینێت!

خۆ ئەگەر بزانین ڕێژەی جوانی و کەماڵ و چاکەکاری‌یەکانی ناو بوونەوەران لەچاو جوانی و کەماڵ و چاکەکاریی خوای گەورەدا ناگاتە ئاستی ئەوەی کە هێشتا چەند وردە بریسکانەوەیەکی کز و لاواز بن لەچاو خۆری درەخشاندا، ئەوا دەتوانیت - گەر بە ڕاستی مرۆڤ بیت - پەی بە مەودای ئەو بەختەوەری‌یە بەردەوام و شادی و لەزەت و نیعمەتە ببەیت کە لە بەهرەمەندیی بینینی ئەو کەسەدایە شایانی خۆشەویستیی نەبڕاوە و شەوق و تاسەمەندیی بێ‌سنوور و بینینێکی تەواونەبووی بێ کۆتایی‌یە لە بەختەوەری‌یەکی هەمیشەیی‌دا!

## بەروبوومی پێنجەم

بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤ - هەروەك لە میعراجەوە دەردەکەوێت - "بەر"ێکی بەنرخی ناو بەروبوومەکانی بوونەوەرانە و، بەدیهاتوویەکی بەڕێز و خۆش ویستراوی بەدیهێنەری مەزنە.

جا ئەم بەرە شیرین و بەلەزەتەی کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ بەم میعراجە کردی بە دیاریی دەستی بۆ گرۆی جینێ و ئادەمیزاد، مرۆڤی لەو ئاستەوە کە: بەدیهاتوویەکی بچووك و زیندەوەرێکی لاواز و خاوەن هەستێکی کۆڵەوار بێت، بەرزکردەوە و گەیاندیە مەقامێکی بەرز و پلە و پایەیەکی یەکجار بڵند، تەنانەت بۆ بەرزترین پلەی عیززەت و ڕێز لێگیراوی بەسەر هەموو بەدیهاتوواندا بەرزی کردەوە. ئیتر ئەم بەروبوومە هێندە خۆشی و شادمانی و بەختەوەریی بێ گەردی بەم مرۆڤە بەخشی کە وەسف کردنی لە توانادا نی‌یە.

چونکە ئەگەر بە هەر تاکە سەربازێك بوترێت: ئەوا کرایت بە "موشیر" لە سوپادا، ئایا چەندە منەتبار و سوپاسگوزار و دڵخۆش و ڕازی و شادمان دەبێت؟ دیارە ئەندازەی ئەوە ناتوانرێت دەستنیشان بکرێت..

ئەی ئەگەر ئەم مرۆڤەی کە بەدیهاتوویەکی لاواز و، زیندەوەرێکی هۆشمەند(حەیوانێکی ناتیق) و، کۆڵەوارێکی لەناوچووە و، لە بەردەم مشتەکۆڵەکانی جودایی و نەماندا زەلیل و دەستەوسانە، پێی بوترێت:

دەچیتە ناو بەهەشتێکی هەمیشەیی و.. لە نیعمەتی سۆز و میهری فراوان و هەتاهەتایی خواوەندی میهرەباندا دەبیت و.. بەناو مولك و مەلەکووتی ئەودا - کە جێی ئاسمانەکان و زەویی تێدا دەبێتەوە - گەشت و گوزار و سەیران دەکەیت و.. بە خێرایی "ئەندێشە" و فراوانیی "ڕۆح" و توانا و هاتوچۆی "ژیری" لەزەت لە هەموو ئارەزووەکانی "دڵ"ت دەبەیت.. لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، لە بەختەوەریی هەمیشەیی‌دا، بەهرەمەندی: بینینی جوانیی موقەددەسی خواوەند دەبیت..

گەر ئەم مژدەیە بەو کەسە بدرێت، ئەوا هەر مرۆڤێك پلەی مرۆڤایەتیی خۆی نەدۆڕاندبێت و لە ئاستی مرۆڤ دانەبەزیبێت، دەتوانێت مەودای ئەو خۆشی و شادمانی‌یەی کە دڵ و دەروونی ئەو مژدە پێدراوە پڕ دەکەن، هەست پێ بکات و بزانێت!

* * *

ئێستاش ڕوو لەو کەسە دەکەین کە لە مەقامی گوێبیستدا دانیشتووە و، پێی دەڵێین:

کراسی ئیلحادی بەرت بدڕێنە و تا دەستت دەگات فڕێی بدە! ئنجا بە گوێی مرۆڤی ئیماندار بیبیستە و بە چاوی موسڵمانیش ببینە، چونکە وا لە نێوان دوو نموونەی بچووکدا نرخ و بەهای چەند بەروبوومێکت بۆ ڕوون دەکەمەوە:

**نموونەی یەکەم:**

وا دابنێ ئێمە لەگەڵ تۆدا لەناو وڵاتێکی فراواندایـن و، کە سەیری هەر لایەك دەکەین جگە لە دوژمنایەتی چیی تر نابینین و، سەرجەمی شتان دوژمنی یەکتری و دوژمنی ئێمەشن. ئنجا هەموو شتێکی ناو ئەو وڵاتەش نامۆن بە ئێمە و نایانناسین، هەموو گۆشەیەکیشی پڕە لە چەندەها تەرمی ئەوتۆ کە ترس و سام و حەپەسان دەخەنە دڵی مرۆڤەوە و لەم لا و لەولاشدا دەنگی گریان و داد و هاواری هەتیوان و ستەم لێکراوان بەرز دەبێتەوە..

لەم کاتەدا کە ئێمە لە ناوەندی ئەم چەشنە کارەسات و ئازارانەداین، یەکێك دەڕوات بۆ لای پادشای وڵات و لەو سەرەوە بە مژدەیەکی دڵخۆشکەر بۆ هەموان دەگەڕێتەوە..

جا ئەگەر ئەو مژدەیە شتە نامۆکانی بۆ کردین بە: خۆشەویست و.. شێوەی ئەوانەشی کە بە دوژمنمان دەزانین گۆڕی بە: شێوەی برای دڵسۆز و.. تەرمە ترسناکەکانیشی لە شێوەی: چەند بەندەیەکی ملکەچ و زیکرگۆ و تەسبیح خوێنی خوای گەورەدا دەرخست و، ئەو گریان و هاوارانەشی وەك: حەمد و سەنا و شوکرانەبژێری لێ کرد و.. مردووەکان و ئەو زەوت و تالآن و بڕۆیەشی گۆڕی بە: ڕوخسەتدان و تەسریح کردن لە ئەرکی سەرشان و.. ئێمەش لەم کاتەدا، سەرباری خۆشی و شادمانیی خۆمان، بەشداریمان لە خۆشی و شادمانیی ئەواندا دەکرد..

گەر لەو کاتەدا کەسێك مژدەیەکی ئاوای هێنا، ئەوا دەتوانیت بۆ خۆت مەودای ئەو خۆشی و شادمانی‌یە بزانیت کە، بەو مزگێنی‌یە مەزنە، دڵی هەموومان دەگرێتەوە و گشت لایەکمان پێی شادمان دەبین!

هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە، یەکێك لە بەروبوومەکانی "میعراج"یش بریتی‌یە لە "نووری ئیمان". خۆ ئەگەر دنیا لەم بەروبوومە خاڵی بێت، واتە: بە چاوی "گومڕایی" بۆ بوونەوەران بڕوانرێت، ئەوا بوونەوەران بە: نامۆ و دڕندە و بێزارکەر و زیانبەخش دەبینیت و، تەنە مەزنەکانی وەك چیا و شاخەکانیش بە وێنەی چەند تەرمێك دێنە پێش چاو

کە سام و مەترسی لە دەروونندا دەورووژێنن و، ئەجەلیش بە جەللادێك دەبینێت کە لە گەردنی بوونەوەران دەدات و دەیانخاتە ناو بیری عەدەم و، دەنگ و زایەڵەکانیش بە شین و گریان و هاواری "جودایی" و "نەمان" دەزانێت..

لەو کاتەدا کە چاویلکەی بیری "گومڕایی" بوونەوەرانت بەم جۆرە پیشان دەدات، بەروبوومی میعراج، کە بریتی‌یە لە ڕاستی‌یەکانی ئیمان، دێت و سەرجەمی بوونەوەرانت بۆ ڕووناك دەکاتەوە و، دەری‌دەخات کە ئەو بەدیهاتووانە: برای خۆشەویستی یەکترین و، سەرگەرمی زیکر و تەسبیحن بۆ بەدیهێنەری مەزنیان و، مردن و نەمانیش تەسریح بوون و حەوانەوەیە لە ئەرکی سەرشان و، ئەو دەنگانەش دەنگی تەسبیح و سوپاسگوزارین بۆ خوای گەورە... هتد.

گەر دەتەوێت ئەم ڕاستی‌یە بە جوانترین شێوە ببینیت، ئەوا سەر لە وتەی دووهەمی "وتە بچووکەکان" بدە.

**نموونەی دووهەم:**

وا دابنێ کە ئێمەش لەگەڵ تۆدا لەناو دەشتایی‌یەکی گەورەداین و، لە هەموو لایەکەوە زریانی با و لم دەورەی داوین و، تاریکایی شەویش بووە بە پەردەیەکی ئەوتۆ کە هیچ شتێك تەنانەت دەستەکانی خۆشمان نابینین و، برسێتی زۆری بۆ هێناوین و تینوێتیش ئاگری لە هەناومان بەرداوە و، هیچ یارمەتی‌دەر و پشت و پەنایەکیشمان نی‌یە.. ئنجا وا دابنێ کە لەو کاتەدا ئێمە بەم حاڵەوە دەتلاینەوە، کەسێکی بەڕێز بێت بۆ لامان و پەردەی تاریکی بدڕێنێت و، هۆیەکی گواستنەوەی حەوێنەریشی لەگەڵ خۆیدا بە دیاری بۆ هێنابین و بەو هۆکارە بۆ شوێنێکی وەك بەهەشت بمانگوێزێتەوە و، لەوێدا هەموو شتێکمان بە گوێرەی دڵ بێت و گشت پێداویستی‌یەکیشمان بۆ دابین و ئامادە کرابێت و، کەسێك سەرپەرشتیمان بکات و کاری ئێمەی بەدەست بێت کە خاوەنی ئەوپەڕی بەزەیی و سۆز و میهرەبانی بێت و، هەموو پێداویستی‌یەکی خواردن و خواردنەوەشی بۆ ئامادە کردبێتین..

پێم وایە ئێستا دەزانیت کە: چەندە منەتبار و سوپاسگوزاری چاکەی ئەو کەسە بەڕێزە دەبین کە ئێمەی لە جێ و شوێنی نائومێدی‌یەوە هێنایە جێگایەك سەرتاپا هیوا و ئاوات و خۆشی و شادمانی‌یە!

جا ئەو بیابانە گەورەیە بریتی‌یە: لەم دنیایە و.. زریانی با و لمەکانیش: بزووتنی گەردیلەکان و لافاوی زەمانن کە سەرجەمی ئەم بوونەوەرانە و ئەم مرۆڤە هەژارەیان تێدا دەتلێتەوە.. ئەوەتا هەموو مرۆڤێك نیگەرانە و لە مەترسیی ئەو بەسەرهاتانەدایە کە ڕۆژگارە تاریك و سامناکەکانی داهاتووی بۆیان هەڵگرتووە..

"گومڕایی" دنیای ئاوا پیشان ده‌دات، ناشزانیت هانا و داد بۆ لای کێ بەرێت و، لە برسێتی و تینوێتیدا دەتلێتەوە و گرفتار بووە.

جا "زانین"ی ئەو شتانەی مایەی ڕەزامەندیی خواوەندن - کە یەکێکە لە بەروبوومەکانی "میعراج" - ئەم دنیایە دەکات بە: میوانخانەی میواندارێکی بەخشندەی دەست ڕەنگین و.. خەڵکانیش دەکات بە: میوانی بەڕێز و کار پێ‌سپێرراوی خۆی لە هەمان کاتدا و.. دواڕۆژێکی گەشی وەك "بەهەشت" و، بەتام و لەزەتی وەك "میهرەبانی" و، درەخشانی وەك "بەختەوەریی هەمیشەیی" بۆ دەستەبەر دەکات.

جا ئەگەر بتوانیت تەسەووری ئەمە و ئەوە بکەیت، ئەوا دەتوانیت مەودای چێژ و جوانی و شیرینی ئەو بەروبوومە بزانیت!

* * *

ئەو کەسەی کە تا ئێستا لە مەقامی گوێ‌بیستدا بوو، دەڵێت:

(هەزار شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە! وا بە فەزڵی ئەو خوایە لە ئیلحاد ڕزگار بووم و ڕێی ئیمان و تەوحیدم گرتەبەر و - سوپاس بۆ خوا - ئیمانم بەدەست هێنا).

ئێمەش پێی دەڵێین:

برای بەڕێز!

پیرۆزبایی ئەم ئیمانەت لێ دەکەین و، لە خوا داواکارین لە شەفاعەتی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ﷺ بەشدارمان بکات. ئامین.

اللّهم صلّ على من انشق بإشارتة القمرُ، ونبع من أصابعه الماءُ كالكوثرِ، صاحبِ المعراج وما زاغ البصرُ، سيّدنا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين. من أول الدنيا الى آخر المحشر.

﴿سُبحَانك لا عِلم لَنا إلاّ ما عَلّمتنا إنّك أنت العليمُ الحكيم﴾ (البقرة:٣٢).

﴿ربّنا تَقبّلْ مِنّا إنّك أنتَ السّميعُ العَليم﴾ (البقرة:١٢٧).

﴿ربّنا لا تُؤاخِذنا إنْ نَسينَا أو أخطَأنا﴾ (البقرة:٢٨٦).

﴿ربّنا لا تُزغْ قُلوبَنا بَعدَ إذْ هَدَيْتنا﴾ (آل عمران:٨).

﴿ربّنا أتمِم لَنا نُورنَا وَاغفِر لَنا إنّكَ عَلى كُلّ شيءٍ قَدير﴾ (التحريم:٨).

﴿وآخِرُ دَعْواهُم أنِ الْحَمْدُ لله رَبِّ العَالمينَ﴾ (يونس:١٠).

## پاشکۆی
### وتەی نۆزدەهەم و سی و یەکەم

# موعجیزەی لەت بوونی مانگ

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ ۞ وإِنْ يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ﴾ (القمر:١-٢)

چەند فەیلەسووفێکی ماددی و ئەوانەش کە کوێرانە چاویان لێ دەکەن، دەیانەوێت پەردە بەسەر ڕووی موعجیزەی "لەت بوونی مانگ"دا، کە وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، بگێڕن و لە بەرچاودا لایببەن. ئەوەتا چەند وەهمێکی هەڵە و دوور لە ڕاستی لە بارەیەوە بڵاو دەکەنەوە و دەڵێن: (ئەگەر موعجیزەی لەت بوونی مانگ لە ڕاستیدا ڕووی بدایە، ئەوا سەرانسەری جیهان دەیزانی و، هەموو کتێبەکانی مێژوویش باسیان دەکرد)!

**وەڵام:**

موعجیزەی لەت بوونی مانگ لە بەردەم کۆمەڵێکدا ڕووی داوە کە دەعوای پێغەمبەرێتیی پێغەمبەریان ﷺ بیست و ئینکاریيان کرد، ئەم موعجیزەیەش بۆ چەسپاندنی ئەو دەعوایە ڕووی داوە. ڕوودانەکەشی لە شەودا و لە کاتێکدا کە خەڵکی بێ ئاگابوون و بە شێوەیەکی کاتیش بووە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە جیاوازیی هەڵاتگەکان(مطـــالع) و پەڵە هەور و، هۆکارەکانی تری جگە لەمانەش، ڕێ لە بینینی مانگ دەگرن. شتێکی ئاشکرایشە کە هۆکارە شارستانیيەکانی نوێ و کاروباری ڕوانین و سەیرکردنی بۆشایی ئاسمان، وەك ئێستا، بڵاو نەبووە.

کەواتە مەرج نیيە کە هەرچی کەس هەیە لە هەموو جێگایەکدا ئەم لەت بوونەی مانگ ببینێت و، ئەم ڕووداوەش بچێتە ناو کتێبەکانی مێژووەوە!

ئێستا لە نێوان چەندین خاڵی زۆردا گوێ بۆ پێنج خاڵ ڕابگرە، کە گوێت ڕاگرت، ئەوا پشت بەخوا، هەموو ئەو پەڵە هەورە وەهمیيانەی کە لەسەر ڕووی ئەم موعجیزەیە کەڵەکە بوون، دەڕەوێنەوە:

● **خاڵی یەکەم:**

سەرسەختی و ملنەدانی کافرانی ئەوکاتە - بەپێی هەواڵی مێژوو - شتێکی بەناوبانگ و زانراوە. جا کاتێ کە قورئانی پیرۆز ئەم موعجیزەیەی بە ئایەتی: ﴿**وانشَقَّ القمر**﴾ راگەیاند و، دەنگدانەوەی ئەم ئایەتەش بە هەموو لایەکدا بڵاو بووەوە، هیچ کام لەو کافرانەی کە باوەڕیان بە قورئان نەدەکرد، نەیانتوانی و پرکێشیی ئەوەیان نەکرد کە ئەم ئایەتە بە درۆ بخەنەوە، واتە: بڵێن: درۆیە، ڕووداوی وا ڕووی نەداوە. چونکە ئەگەر لە ڕاستیدا ئەو موعجیزەیە ڕووی نەدایە و، شتێکی چەسپاو نەبوایە لایان، ئەوا بە توندی بۆ بە درۆخستنەوەی و بەتاڵکردنەوەی دەعوای پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ ڕادەپەڕین. خۆ ئەوەتا هەموو کتێبەکانی مێژوو بگەڕێ، هیچ کامیان چ قسەیەکی کافرانی سەبارەت بە ئینکاری کردنی لەت بوونی مانگ نەقڵ نەکردووە، مەگەر ئەوە نەبێ کە قورئان خۆی لە ئایەتی: ﴿**ویقولوا سحرٌ مستمر**﴾دا ڕوونی کردووەتەوە. ئەویش بریتییە لەوەی کە: ئەو کافرانەی ئەم موعجیزەیان بە چاوی خۆیان دی، وتیان: "ئەمە سیحرە" کەواتە با چەند کەسێك بڕۆن بۆ شوێنانی تر و بپرسن ئایا خەڵکی ئەو شوێنانەش ئەمەیان دیوە یان نا؟ کە ڕۆژ بووەوە لە "یەمەن" و شوێنانی ترەوە کاروان گەیشتە ئەوێ، کافرەکانیش هەواڵی ئەمەیان لێ پرسین، ئەوانیش وتیان: بەڵێ، ئەمەمان دیوە. ئنجا کافرەکان وتیان: (سیحری هەتیوەکەی ئەبوو تالیب گەیشتووەتە ئاسمانیش)!

● **خاڵی دووهەم:**

زۆربەی پێشەوایانی زانستی کەلام، وەك سەعدی تەفتازانی، وتوویانە: (ڕوودانی لەت بوونی مانگ موتەواتیرە، وەك هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانی و تێراوبوونی سوپایەکی تەواو لەو ئاوە و، وەك گریان و بێتاقەتیی بنەدارەکەی ناو مزگەوت لە دووریی پێغەمبەر ﷺ کە لە کاتی خوتبەدا پاڵی پێوە دەدایەوە و، کە ئەمەش کۆمەڵی ناو مزگەوت هەموویان گوێیان لێ بوو.. واتە: ئەم ڕووداوە کۆمەڵێکی زۆر لە کۆمەڵێکی زۆرەوە، کە هەرگیز ناگونجێ لەسەر درۆ یەکیان گرتبێت، دەماودەم هێناویانە و بەم جۆرە بە ئێمەش گەیشتووە. کەواتە ڕووداوەکە موتەواتیری قەتعی و بێ گومانە، وەك گومان نەبوون لە هەواڵی دەرکەوتنی ئەستێرەیەکی کلکدار لە پێش هەزار ساڵدا و، بوونی دوور گەی: سەرەندیب، هەرچەندەش نەماندیوە).

بەم جۆرە بۆت دەرکەوت کە ورووژاندنی گومان لە دەوری ئەم مەسەلە بێ گومانە و هاوچەشنی ئەمەدا کە بە چاو دەبینرێن، لە نەفامی و بێعەقڵی بەولاوە هیچی تر نییە. چونکە لەم مەسەلانەدا ئەوەندە بەسە کە بزانرێت یەکێکە لە گونجاوەکان(الممكنات) نەك لە

نەگونجاوەکان(المستحیلات). خۆ لەت بوونی مانگیش شتێکی گونجاوە و وەکو ئەوە وایە کە چیایەك بە تەقینەوەی گڕکانێك لەت ببێت.

● **خاڵی سێهەم:**

موعجیزە بۆ ئەوە پیشان دەدرێت کە ئەوانەی ئینکاریی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، قەناعەت بە پێغەمبەرێتی‌یەکەی بکەن، نەك بۆ ئەوەی ناچاریان بکات ئیمانی پێ بهێنن! کەواتە هەر هێندە پێویستە کە ئەو موعجیزەیە پیشانی ئەوانە بدرێت دەعوای پێغەمبەرێتیان بیستووە، بەو ئەندازەیەی کە بیانگەیەنێتە دڵنیایی و قەناعەتی تەواو لە ڕاستیی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەردا ﷺ.

بەڵام دەرخستنی ئەو موعجیزەیە لە هەموو جێگایەکدا و بە ڕوونی، بە جۆرێك کە خەڵکی ناچار بکات بۆ ئیمان هێنان و ملکەچ کردن، ئەم کارە، شتێکە دژی حیکمەتی خواوەندی دانای شکۆمەندە و پێچەوانەی نهێنیی "تەکلیف"ە کە خوا لە بەندەکانی دەکات. چونکە نهێنیی ئەو تەکلیفەی خواوەند داخوازی ئەوەیە کە دەرفەت بە ژیریی مرۆڤ بدات و "ویست" و "ئیختیار"ی لێ دانەماڵێت!

خۆ ئەگەر خواوەندی بەدیهێنەر موعجیزەی لەت بوونی مانگی بۆ ماوەی دوو سەعات بهێشتایەتەوە و پیشانی هەموو جیهانی بدایە و بچوایەتە ناو کتێبەکانی مێژوو - وەك فەیلەسووفەکان دەیانەوێت - ئەوا ئەو کاتە کافران دەیانوت: ئەمە دیاردەیەکی گەردوونیی ئاسایی‌یە و، ئیتر ئەو کاتە نەدەبوو بە بەڵگە لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ و بە موعجیزەیەکی تایبەتیی پێغەمبەری مەزن ﷺ دانەدەنرا، یان دەبووە موعجیزەیەکی بەدیهیی وا کە عەقڵی ناچار دەکرد باوەڕ بهێنێت و ئیختیار و ویستی لێ دەسەندەوە و ئەو کاتەش ڕۆحە نزمە خەڵووزئاسا بێ‌نرخەکانی وەك هی ئەبووجەهل لەگەڵ ڕۆحە پاك و بەرز و ئەڵماس‌ئاساکانی وەك هی حەزرەتی ئەبووبەکری صیددیق - خوای لێ ڕازی بێت - یەکسان دەبوون! واتە ئەو کاتە نهێنیی تەکلیفی خوا لە بەندەکانی، لەناودەچوو.

لەبەر ئەوە، ئەم موعجیزەیە بە شێوەیەکی کاتی و، لە شەودا و، لە کاتی بێ‌ئاگاییدا ڕووی داوە و، جیاوازیی هەلاتگەکان و، هەور و شتی تریش بوون بە پەردە و ڕێیان لەوە گرتووە کە هەموو خەڵکی ببینن. لەبەر ئەوانەیە کە ئەم موعجیزەیە نەڕۆشتووەتە ناو کتێبەکانی مێژووەوە.

● **خاڵی چوارەم:**

ئەم موعجیزەیە کە لە شەودا و، بە شێوەیەکی کاتی و، لە وەختی بێ ئاگاییدا ڕووی داوە، دیارە بێ هیچ گومانێك هەموو کەسێك لە هەموو جێگایەکدا نایبینێت. بەڵکو ئەگەر

هەندێ کەسیش ببینێت، باوەڕ بە چاوی خۆی ناکات! خۆ ئەگەر باوەڕیشی پێ بکات، ئەوا ڕووداوێکی وا کە لە دەمی یەك کەسەوە بگێڕرێتەوە، لە لای مێژوو بایەخی پێ نادرێت.

زانا لێکۆڵەرەکان ئەو زیادەیەیان ڕەتداوەتەوە کە لە ڕیوایەتی ئەم موعجیزەیەدا زیاد کراوە کە گوایا: (دوای لەت بوون، مانگ هاتووەتە سەرزەوی)! ئەو زانایانە ئەم زیادەیەیان لە لا نەچەسپاوە و فەرموویانە: لەوانەیە هەندێ لە مونافیقان ئەمەیان لەسەر ڕیوایەتەکە زیاد کردبێت تاکو بایەخ بۆ هەموو ڕیوایەتەکە نەهێڵن و، نرخ و بەهایشی دابگرنە خوارەوە!

ئنجا دەبێ بزانین لەو کاتەدا کە موعجیزەکە ڕووی داوە، پەڵە هەوری نەزانی ڕووی ئاسمانی ئینگلتەرای داپۆشیبوو، کاتیش لە ئیسپانیا لە خۆرئاوابووندا بوو، ئەمریکاش لە ڕۆژی ڕووناکدا بوون و، لە چین و ژاپۆنیش تازە بەرەبەیان سەری دەرهێنابوو، لە وڵاتەکانی تریشدا چەند ڕێگرێکی تر هەبوون لە ڕێی بینینی ئەم موعجیزەیەدا، کەواتە ئەم موعجیزەیەیان تێدا نابینرێت!

جا کە ئەمەت زانی، ئنجا سەرنج لە قسەی ئەو کەسە بدە کە دەڵێت: (مێژووی ئینگلتەرا و چین و ژاپۆن و ئەمریکا و وڵاتانی تری وەك ئەوان، ئەم ڕووداوە باس ناکەن، کەواتە ڕووی نەداوە)!

ئەمە چ چەنەبازی‌یەکە ئەوانە دەیکەن؟!

دەسا زەرەرمەندی و ڕسوایی بۆ ئەوانەی کە بە پاشخوانی ئەورووپا دەژین!

● **خاڵی پێنجەم:**

"لەت بوونی مانگ" ڕووداوێك نی‌یە کە هەر لە خۆیەوە و لەسەر بناغەی چەند هۆکارێکی سروشتی و لە ڕێگای ڕێکەوتەوە ڕووی دابێت. نەخێر.. بەڵکو بەدیهێنەری دانا – کە پەروەردگاری خۆر و مانگە – ئەم ڕووداوەی بەسەر مانگدا هێناوە و کردوویەتی بە ڕووداوێکی بازدەر بەسەر هەموو یاسا گەردوونی‌یەکاندا، لە پێناوی تەسدیق کردنی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی‌دا ﷺ و، بۆ ئەوەی کە دەری بخات بانگەوازی ئەم پێغەمبەرە ﷺ بانگەوازێکی ڕاستە. کەواتە خواوەندی گەورە بەپێی دانایی و، داخوازیی نهێنیی ڕێنمایی و تەکلیف و، حیکمەتی ڕاگەیاندنی پەیامەکانی خۆی کە پێغەمبەر ﷺ ڕایاندەگەیەنێت، ئەو موعجیزەیەی پیشان داوە و، بۆ ئەوەی بیانووی ئەو کەسانەش ببڕێت کە موعجیزەکەیان دیوە.. لە هەمان کاتیشدا خواوەند بەپێی خواستی دانست و ویستی خۆی، ئەم موعجیزەیەی پیشانی دانیشتووانی شوێنەکانی تری جیهان نەداوە، لەو شوێنانەی کە بانگەوازی پێغەمبەرەکەی خوایان پێ نەگەیشتووە و، بە پەڵە هەور و جیاوازیی هەڵاتگەکان و مانگ هەڵنەهاتن یان خۆر هەڵهاتن لە هەندێ وڵاتدا و بوونی ڕۆژ لە

هەندێکی تردا و خۆرئاوابوون لە غەیری ئەواندا، بەمانە و غەیری ئەمانە لەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی نەبینینی مانگ، ئەو موعجیزەیەی پێش‌چاوی ئەوان نەخستووە.

جا ئەگەر ئەو موعجیزەیە پیشانی هەموو خەڵکی جیهان بدرایە، ئەوا یان: لە ئەنجامی ئیشارەتی پێغەمبەری مەزنەوە ﷺ و بۆ مەبەستی دەرخستنی موعجیزە پێغەمبەرانەکەی پیشانیان دەدرا، دیارە ئەو کاتە دەبوو بە شتێکی بەدیهی و خەڵکی ناچار دەبوون باوەڕی پێ بکەن. واتە "ویست" و "ئیختیار"یان لێ دەسەندرایەوە و نهێنیی تەکلیف تیا دەچوو. لە کاتێکدا کە ئیمان پارێزگاری لە سەربەستیی "عەقڵ" دەکات و نایەوێت ویست و ئیختیاری لێ دابماڵێت.. یان: وەك ڕووداوێکی ئاسمانیی ڕووت پیشانیان دەدرا، ئەو کاتەش پەیوەندیی بە پێغەمبەرێتیی پێغەمبەرەوە ﷺ دەبچڕا و، هیچ تایبەتکاریەکی تێدا نەدەما.

**بە کورتی:** هیچ دوودڵیەك لە ڕوودانی "لەت بوونی مانگ"دا نیە و، بە جۆرێکی بێ گومان بۆمان چەسپا. وا ئێستاش دوای ئەمە، لە نێوان بەڵگە بێ گومان و زۆرەکاندا بە شەش بەڵگە[1] ئاماژە بۆ ڕوودانی ئەم موعجیزەیە دەکەین، کە ئەمانەن:

★ یەکدەنگیی هەموو هاوەڵە دادوەرەکانی پێغەمبەر ﷺ.

★ یەکگرتنی زانایانی لێکۆڵەر و تەفسیرنووسان، کاتێك کە تەفسیری ئایەتی: ﴿**وانشق القمر**﴾یان کردووە.

★ زانا ڕاستگۆکانی "فەرموودە" لە ڕیوایەتەکانیاندا ڕوودانی ئەم موعجیزەیەیان بە چەندین سەنەد و ڕێگای جیاجیا نەقڵ کردووە[2].

★ شایەتیدانی هەموو ئەهلی "کەشف" و "ئیلهام" لە ئەولیا و پیاوچاکە ڕاستگۆکان.

★ تەسدیق کردنی ئەم موعجیزەیە لە لایەن پێشەوا هەرە زاناکانی عیلمی کەلامەوە، هەرچەند مەشرەب و ڕێبازەکانیشیان جیاوازن.

---

(١) واتە شەش بەڵگەی توندوتۆڵی بێ گومان لە نێوان شەش جۆر یەکدەنگیدا هەن لەسەر ڕوودانی لەت بوونی مانگ. بەڵام بەداخەوە لەم مەقامەدا مافی خۆیمان نەداییێ و بە کورتی مایەوە. (دانەر)

(٢) لێرەدا سێ فەرموودە دەهێنین لەوانەی کە ئیمامی بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوون:
١- عن عبد الله بن مسعود رضي الله عنه قال: انشق القمر على عهد رسول الله ﷺ شقين فقال النبي ﷺ: "اشهدوا". متفق عليه. ٢- وعن انس رضي الله عنه أن أهل مكة سألوا رسول الله ﷺ أن يريهم آيةً، فأراهم انشقاق القمر. متفق عليه. ٣- وعن ابن عباس رضي الله عنهما إن القمر انشق في زمان النبي ﷺ متفق عليه. راجع: مسند الإمام أحمد ١/ ٣٧٧، ٤١٣، ٤٤٧، ٤٥٦، ٣/٢٠٧، ٢٢٠، ٢٧٥، ٢٧٨، ٤/٨١ ورواه الطيالسي برقم ٢٩٥، ١٨٩١، ١٩٦٠. وتفسير ابن كثير (٦/٤٦٩) لمعرفة تواتر الحادثة. وانظر كذلك: اللؤلؤ والمرجان فيما اتفق عليه الشيخان. ج٣/ص٢٨٠ (وەرگێڕ)

★ قبوولّ کردنی ئەم موعجیزەیە لە لایەن نەتەوەی ئیسلامەوە، کە هەروەك لـە فـەرمووەدەدا هاتوە: "لەسەر گومڕایی هەرگیز کۆ نابنەوە و یەك ناگرن".

هەموو ئەمانە، ڕوودانی لەت بوونی مانگ ڕوون دەکەنەوە و، وەك خۆری ناوجەرگەی ئاسمان دەیچەسپێنن.

**پوختەی ئەم قسانە:**

ئەوەی تا ئێستا باسمان کرد، شتێك بوو بە ناوی لێکۆڵینـەوەی زانستییەوە و بـۆ مەبەستی بێدەنگ کردنی لایەنی بەرامبەر باسمان کرد. وا دوای ئەمە، بە ناوی "حەقیقەت" و لە پێناوی "ئیمان"دا دەدوێین. زانیمان کە لێکۆڵینەوەی زانستی چی دەڵێت.. بەلاّم حەقیقەت دەڵێت:

کۆتاییهێنەر بە دیوانی پێغەمبەرێتی و مانگی درەخشانی ئەو ئاسمانە کە حەزرەتی "محمـد المصطفی"یە ﷺ، ویلایەتی بەندایەتییەکەی ئەو تا پلەی "مەحبووبییەت" بەرز بـووەوە، ئـەوەتا کەرامـەت و موعجـیزە هـەرە گەورەکـەی ئـەوی بـە "میعـراج" دەرخسـت، واتـە بـە: هاتـوچۆکـردن و ڕۆشـتنی جـەسـتەیەکی سـەر ڕووی زەوی بـەناو ئاسـۆکانی ئاسمانـە بـەرزەکانـدا و خۆناساندنی بە ئەهلی ئاسمانەکان و، بەو موعجیزەیەی ویلایەتە گـەورەکەی خۆی و، خۆشەویستییە بێ گەردەکەی بۆ خوا و، بەرزبوونەوەی بەسەر ئەهلی ئاسمانـاندا بـۆ ئاسـمان نشینان چەسپاند.. هـەر بـەو جـۆرەش خواوەنـد ئەو مانگـەی کـە بـە ئاسمـاندا هـەڵی واسیوە و پەیوەندیی بە زەوییەوە هەیە، تەنـها بـە ئیشـارەتێکی بەندەکـەی خـۆی لـەسـەر زەوییـەوە، کـرد بـە دوو لەتـەوە و، بـۆ مەبەسـتی چەسـپاندنی پێغەمبـەرێتیی ئـەو بـەندە خۆشەویستەی خۆی، ئەم موعجیزەیەی ئەوی پیشـانی زەوینشینان دا، بە ڕادەیەکی وا کە پێغەمبـەر ﷺ وەك دوو بەشـە ڕووناکەکەی مـانگی لـێ هـات، چونکـە بـە هـەر دوو بـاڵی نوورانیی: "ویلایەت" و "پێغەمبەرێتی" بۆ بەرزترین پلـەی کـەمالاّت بـەرز بـووەوە تـا گەیشتە "قاب قوسین" یان نزیکتر.. جا هەروەك مایەی شانازیی زەوی نشینانە، هەروەها بوو بە مایەی شانازیی ئەهلی ئاسمانیش.

عليه وعلى آله وصحبه الصلاة والتسليمات ملء الأرض والسموات.

﴿**سبحانك لا علمَ لنا إلاّ ما علَّمتنا إنك أنت العليم الحكيم**﴾.

اللهم بحق من انشق القمر باشارته، اجعل قلبي وقلوب طلبة رسائل النـــور الصـــادقين كالقمر في مقابلة شمس القرآن. آمين.آمين.

# وتەی سی و دووهەم

## ئەم وتەیە سێ هەڵوێستە

**ئەم وتەیە پاشکۆیەکە بریسکانەوەی هەشتەمی "وتەی بیست و دووهەم" ڕوون دەکاتەوە و، تەفسیرێکیشە بۆ یەکەم زمان لەو پەنجا و پێنج "زمانی حاڵ"ەی بوونەوەران کە شایەتن لەسەر "یەکتایی" خوای گەورە، لەوانەی کە لە پەیامی "دڵۆپێك لە دەریای تەوحید"دا ئاماژەیان بۆ کراوە و[1] لە هەمان کاتیشدا یەکێکە لە ڕاستی‌یە زۆرەکانی ئایەتی پیرۆزی: ﴿لَوْ كانَ فيهِما آلِهَةٌ إلاّ اللهُ لَفَسَدَتا﴾ و پۆشاکی چیرۆکی نموونەیی پۆشیوە.**

## هەڵوێستی یەکەم

بسم الله الرَّحمن الرَّحيم

**﴿لَوْ كانَ فيهِما آلِهَةٌ إلاّ اللهُ لَفَسَدَتا﴾** (الأنبياء:٢٢)

(لا إلهَ إلاّ الله، وحدَهُ، لا شريكَ لهُ، لهُ المُلكُ، ولهُ الحمدُ، يُحيي، ويميتُ، وهو حيٌّ لايموت، بيدهِ الخيرُ، وهوَ على كلِّ شيْءٍ قديرٌ، وإليهِ المصير).

پێشتر لە شەوێکی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا، ڕوونم کردەوە کە هەموو یەکێك لە یازدە ڕستەکانی ئەم گوفتارە تەوحیدی‌یە، مژدەیەکی دڵخۆشکەر و پلەیەکی لە پلەکانی تەوحید تێدایە. ئنجا واتا جوانەکانی ڕستەی: "لا شريكَ لهُ"شمان بە تەواوی و بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە لە تێگەیشتنی عەوامی خەڵکی‌یەوە نزیك بێت، لە شێوەی گفتوگۆیەکی تەمسیلی و وتووێژێکی گریمان کراودا و بە بەکارهێنانی زمانی حاڵ لەسەر شێوەی زمانی گوفتاردا، شی کردەوە.

(١) یەکێکە لە نامیلکەکانی کۆمەڵە پەیامی "مەسنەویی نووری". (وەرگێڕ)

وا ئێستا بـه داخوازیـی ئـه‌و بـرا ئازیزانـه‌م كـه لـه كاروبـارمدا یارمـه‌تیم ده‌ده‌ن و لـه‌سـه‌ر خواست و ئاره‌زووی هاوه‌ڵه‌كانی مزگه‌وتم، به‌م جـۆره‌ی خـواره‌وه ئـه‌و وتوویـژه ته‌مسیلی‌یه لێره‌دا باس ده‌كه‌ین:

گریمان كه‌سێك هه‌بێت نوێنه‌ری گشـت ئـه‌و هاوبه‌شـانه بێـت كـه سـه‌رجه‌می جۆره‌كـانی ئه‌هلی: شیرك و كوفر و گومڕایـی، بـه‌ وه‌همـی خۆیـان ته‌سـه‌ووری ده‌كـه‌ن ، وه‌ك: سروشـت په‌رستان و موشریكان و ئه‌وانـه‌ی باوه‌ڕیـان بـه كاریگـه‌ریی هۆكاره‌كـان هه‌یـه. هـه‌روه‌ها وا داده‌نێین كه ئه‌و كه‌سـه گریمـان‌كراوه ده‌یـه‌وێت ببێـت بـه خـاوه‌ن و پـه‌روه‌ردگاری ته‌نـها یـه‌ك شت له بوونه‌وه‌رانی ناو ئه‌م جیهانه و لافی خاوه‌نێتیی ڕاسته‌قینه‌ی ئه‌و شته لـێ بدات!

ئـه‌م لاف لێـده‌ره، پێـش هـه‌موو شـتێك لـه‌گـه‌ڵ "گه‌ردیلـه"دا، كـه بچووكـترین شـتی نـاو بوونه‌وه‌رانه، چاوپێكه‌وتنی ساز كرد و، به زمانی سروشت و فه‌لسه‌فه‌ی ماددی پێی وت كـه: په‌روه‌ردگار و خاوه‌نی ڕاسته‌قینه‌ی ئه‌وه!

یه‌كسه‌ر گه‌ردیله‌كه به زمانی "حه‌قیقه‌ت" و ئه‌و "دانست"ه په‌روه‌ردگاری‌یه‌ی كـه تیـایدا دانراوه، وه‌ڵامی دایه‌وه و وتی:

- مـن گه‌لـێ كاروبـار و ئـه‌ركی له‌ژماره‌به‌ده‌ر ئـه‌نجام ده‌ده‌م. ئـه‌وه‌تا ده‌ڕۆمـه نـاو هـه‌موو به‌دیهاتوویه‌ك، هه‌رچه‌نده‌ش جۆراوجـۆر و جیاجیـان. جـا تـۆش - ئـه‌ی بابـای لاف لێـده‌ر! - ئه‌گه‌ر خاوه‌نی زانستێكی هێنده فراوانیت كـه ئاگـای لـه هـه‌موو ئـه‌و ئیـش و كارانـه بێـت و، گه‌ر خاوه‌نی توانسـتێكی گشـتی و هه‌مه‌لایه‌نـه‌ی ئـه‌وتۆ بیـت كـه هـه‌موو ئـه‌و كـار و ئه‌ركانـه ئاراسته و ڕێنمایی بكات، هه‌روه‌ها ئه‌گـه‌ر فـه‌رمان و ده‌سته‌ڵاتێكی زاڵ و جێ‌به‌جێ كـراوی ته‌واوه‌تیت ببێت و بتوانیت من و گه‌ردیله كارگوزاره‌كانی هاوچه‌شنم[(١)] كـه لـه بوونـه‌وه‌ردا هـاتوچۆ ده‌كـه‌ن، ژێربـار بخـه‌یت و بـۆ كاره‌كانمـان ئاراسـته‌مان بكـه‌یت.. هـه‌روه‌ها ئه‌گـه‌ر

---

(١) بـه‌ڵێ، هـه‌موو شـتێكی بزۆك، هـه‌ر لـه گه‌ردیله‌كانـه‌وه تـا ده‌گاتـه هه‌سـاره گه‌رۆكـه‌كان، بـه‌و ته‌مغـه و مـۆری صه‌مه‌دانییه‌ته‌ی كه به‌سه‌ریانه‌وه نه‌خشاوه، به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر "یه‌كتایی" خـوای گـه‌وره. چونكـه گشـت ئـه‌و شـوێنانه‌ی كه هاتوچۆیان تێدا ده‌كه‌ن به موڵكی خاوه‌نه تاك و ته‌نیاكه‌ی خۆیانی ده‌رده‌خـه‌ن. ئنجـا به‌دیـهاتووه نه‌بزۆكه‌كانیش هه‌ر له ڕووه‌كه‌كانه‌وه تا ده‌گاته ئه‌ستێره چه‌سپاوه‌كان، وه‌ك "مۆری یه‌كتایی" وان، چونكه هه‌ریه‌كه‌یان جێگاكه‌ی خۆی بـه وێنـه‌ی نامه‌یـه‌كی به‌دیهێنه‌ره‌كه‌یان ده‌خه‌نه پێش‌چاو. بـه‌و واتایـه‌ی كـه هـه‌موو ڕووه‌ك و بـه‌رێك مۆرێكـی یـه‌كتایی وه‌هایـه كـه ده‌بێـت بـه به‌ڵگـه له‌سـه‌ر ئـه‌وه‌ی كـه جێگـه و شـوێنه‌كانیان نامه‌یـه‌كی نووسـراوی به‌دیهێنـه‌ره ناوازه‌كه‌یانه!

به پوختـی: هـه‌موو شـتێكی بـزۆك لـه ده‌مـی جموجوولـی‌دا، بـه نـاوی وه‌حدانییه‌تـه‌وه به‌سـه‌ر هـه‌موو شـتانی تـردا زاڵ ده‌بێت. واته ئه‌و كه‌سه‌ی كه جڵه‌وی سه‌رجه‌می ئه‌ستێره‌كانی له‌ده‌سـتدا نـه‌بێت هـه‌رگیز ناشـبێت بـه په‌روه‌ردگار و خاوه‌نی گه‌ردیله‌ش! (دانه‌ر)

بتوانیت خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو بوونەوەرانە بیت کە من بەشێکم لەوان - وەك خڕۆکە سوورەکانی خوێن - و بە تەواوەتی و ڕێکوپێکی دەستکاریان بکەیت.. ئەوا دەتوانیت خۆت بە خاوەنی من لە قەڵەم بدەیت و ئیشی من بە غەیری بەدیهێنەری خۆم بسپێریت! دەنا بێ‌دەنگ بە! چونکە ناتوانیت خۆت لە کاری مندا هەڵبقورتێنیت، جگە لەوەی کە هەرگیز ناشتوانیت خاوەن و پەروەردگاری من بیت، چونکە ئەو ڕێسا ورد و ڕێك و کامڵەی کە لە کار و ئەرك و جموجووڵەکانی ئێمەدا هەن بە چەشنێکی ئەوتۆن کە ئەگەر کەسێك خاوەنی دانستی ڕەها و زانستی گشتگیر(محیـــط) نەبێت، هەرگیز ناتوانێت ئەو ڕێسا وردە کامڵە بسازێنێت و بەڕێوەی ببات، تەنانەت گەر هەر کەسێکی تر جگە لەو دەستی تێ وەربدات تێکی‌دەدات و هەڵی دەوەشێنێت!

کەواتە ئەی لاف لێدەر! تۆ چۆن دەتوانیت دەست بۆ کاروباری ئێمە ڕابکێشیت لە کاتێکدا کە خۆت کۆڵەوار و، بێ گیان و، کوێر و، دیلی: سروشت و ڕێکەوتی کتوکوێریت!

بابای لاف لێدەر لێرەدا قسەی ماددی‌یەکانی دووبارە کردەوە و وتی:

- کەواتە هیچ نەبێ خاوەنی خۆت بە، چونکە بۆچی دەڵێیت: لە پێناوی غەیری خۆمدا کار دەکەم؟

گەردیلەکە وەڵامی دایەوە:

- ئەگەر ژیری‌یەکی گەورەی بە ئەندازەی "خۆر" و زانستێکی هەمەلایەنگری چەشنی ڕووناکی‌یەکەی و توانستێکی هەمەلایەنەی وەك گەرمیی خۆرم ببوایە و، خاوەنی هەست و نەستێکی فراوانی وەك حەوت ڕەنگەکانی ناو ڕووناکی‌یەکەی خۆر بوومایە و، ڕوویەکی ئەوتۆم ببوایە کە پێم بڕوانیایە بۆ هەموو ئەو شوێنانەی کە گەشتیان تێدا دەکەم و، خاوەنی چاوێکی بینەر و گوفتارێکی جێ‌بەجێ کراو بوومایە لەناو ئەو بوونەوەرانەی کە ڕوویان تێ دەکەم، ئەوا لەوانەیە منیش وەکو تۆ خۆم گەوج و گێل بکردایە و لافی فەرمانڕەوایەتیم بۆ خۆم لێ بدایە! کەواتە بڕۆ گۆڕت ون بکە.. لەناو ئێمەدا جێگات دەست ناکەوێت!

هەر کە نوێنەر و بانگەوازکاری شیرك دەستی لە گەردیلە داشۆرد و لێی نائومێد بوو، ڕووی کردە "خڕۆکەیەکی سوور"ی خوێن، بەو هیوایەی شتێکی لێ بەدەست بهێنێت. بۆیە بە زمانی هۆکارەکان و سروشت و لە گۆشەی بۆچوونی فەلسەفەوە، پێی وت:

- من پەروەردگار و خاوەنی تۆم!

یەکسەر "خڕۆکە سوور"ەکە بە زمانی "حەقیقەت" و بە زمانی "دانستی پەروەردگاری" بەرپەرچی دایەوە و، وتی:

– من ته‌نیا نیم، چونكه خۆم و سه‌رجه‌م هاوچه‌شنه‌كانم له‌ سوپای چڕ و پڕی خوێنـدا یه‌ك ڕێسامان هه‌یه‌ و ئه‌ركی سه‌رشانمان یه‌كێكه‌ و به‌ فه‌رمانی یه‌ك فه‌رمانده‌ ده‌ڕۆین و ده‌جوولێین. جا ئه‌گه‌ر ده‌توانیت جڵه‌وی من و هاوچه‌شنه‌كانم له‌ناو خوێندا به‌ده‌سته‌وه‌ بگریـت و خـاوه‌نی دانستێكی هێنـده‌ ورد و توانستێكی ئـه‌وه‌نده‌ مـه‌زن بیـت كـه‌ بـه‌ تـه‌واوه‌تی به‌سـه‌ر گشـت خانه‌كانی ئه‌و له‌شـه‌دا زاڵ بیـت كـه‌ ئێمـه‌ی تێـدا ده‌گـه‌ڕێین و بـۆ ئـه‌نجامدانی گه‌لـێ ئـه‌ركی گرنگ – به‌وپه‌ڕی دانایی و ڕێكوپێكی – تیـایدا ده‌خرێینـه‌كار.. ئه‌وا فـه‌رموو ئـه‌و دانسـت و توانسته‌ت پیشان بده‌، چونكه‌ له‌وانه‌یه‌ ئه‌و كاته‌ لاف لێدانه‌كه‌ت واتایه‌كی هه‌بێت.

به‌ڵام تۆ، ئـه‌ی بابـای لاف‌لێـده‌ر! جگـه‌ لـه‌ هـێزێكی كتوكوێـر و سروشـتێكی كـه‌ڕوكاس چیـی تـر شـك نابـه‌یت و، هـه‌رگیز نـاتوانیت بـه‌ ئـه‌ندازه‌ی گه‌ردیله‌یـه‌كیش خـۆت لـه‌ كاروبارماندا هه‌ڵبقورتێنیت، چ جای ئه‌وه‌ی لافی خاوه‌نێتیی ئێمـه‌ لـێ بده‌یـت. چونكـه‌ ئـه‌و ڕێسایه‌ی به‌سه‌ر ئێمه‌دا زاڵه‌ هێنده‌ ورد و توندوتـۆڵ و مه‌حكه‌مـه‌ كـه‌ مه‌گـه‌ر كه‌سـێك هـه‌موو شتێك ببینێت و هه‌موو شتێك ببیستێت و هه‌موو شتێك بزانێـت و ویستی له‌سـه‌ر هـه‌ر شـتێك بێت بتوانێت ده‌ست‌به‌جێ ئـه‌نجامی بـدات، ده‌نـا كه‌سـی تـر نـاتوانێت حوكمڕانیمـان بكـات. له‌به‌ر ئه‌وه‌، بۆ خۆت بێ‌ده‌نگ به‌، چونكه‌ وردی و ڕێسای كـاره‌ مه‌زنـه‌كانمان بوارمـان نـاده‌ن گوێ له‌ چه‌نه‌بازیی تۆ ڕابگرین!

به‌م جۆره‌ "خڕۆكه‌ی سوور"یش لای خۆی ده‌ری كرد!

جـا كـه‌ ئـه‌م لاف لێده‌ره‌ مه‌به‌سته‌كه‌ی لـه‌و خڕۆكـه‌ سـووره‌دا به‌ده‌سـت نـه‌هێنا، ڕۆشـت ڕووی له‌ "خانه‌"یه‌كی له‌ش كرد و، له‌ گۆشه‌نیگای فه‌لسه‌فه‌ و به‌ زمانی سروشت پێی وت:

– نه‌متوانی داواكه‌م به‌ گوێی گه‌ردیله‌ و خڕۆكی سووری خوێندا بده‌م، به‌شكو تـۆ گوێـم لـێ ڕابگریت، چونكه‌ تۆ ته‌نها خانه‌یه‌كی بچووكی ئه‌وتۆیت كه‌ چه‌ند شـتێكی هه‌ڕه‌مـه‌كی و په‌رته‌وازه‌ی لـه‌خۆ گرتـووه‌، بۆیـه‌ ده‌تـوانم دروسـتت بكـه‌م، كه‌واتـه‌ تـۆ ببـه‌ بـه‌ موڵـك و به‌دیهاتووی من!

ئه‌و خانه‌یه‌ش به‌ زمانی دانست و حه‌قیقه‌ت پێی وت:

– بـه‌ڵێ ڕاسته‌ مـن زۆر بچووكـم، بـه‌ڵام كـار و ئه‌ركـه‌كانم گه‌لـێ مـه‌زن و گـه‌وره‌ن و، پـه‌یوه‌ندیی ورد و توندوتۆڵیشـم له‌گـه‌ڵ سـه‌رجه‌م خانـه‌كانی له‌شـدا هه‌یـه‌. ئـه‌وه‌تا گه‌لـێ كارمـه‌ندیی وردم له‌گـه‌ڵ هـه‌موو موولوولـه‌كانی خوێنبـه‌ر و خوێنهێنـه‌ر و ده‌مـاره‌ بزوێنـه‌ر و هه‌ستیاره‌كان و له‌گه‌ڵ سه‌رجه‌م ئه‌و هێزانه‌شدا هه‌یه‌ كه‌ كاروباری لـه‌ش ڕێـك ده‌خـه‌ن، وه‌ك هێزه‌كانی: ڕاكێشه‌ر و پاڵنه‌ر و به‌رهه‌مـهێن و وێنـه‌گر و هاوچه‌شنیان. جـا ئه‌گـه‌ر تـۆی لاف لێده‌ر خاوه‌نی زانستێكی فراوان و، توانستێكی هه‌مه‌لایه‌نه‌ی ئه‌وتۆیت كه‌ بتوانن ئـه‌و ڕه‌گ و

دەمار و هێزانەی نـاو لـەش دروسـت بکـەن و ڕێکیـان بخـەن و لـە ئـەرکی سەرشـانیاندا بیانخەنەکار..

هەروەها ئەگەر دانستێکی هەمەلایەنە و توانستێکی جێبەجێ کراوی ئەوتۆ شك دەبـەیت کە بتوانیت بە هۆیانەوە دەستکاریی کاروباری من و هەموو خانەکانی تری هاوچەشـنم لـەناو جەستەدا بکەیت.. ئەوا فەرموو ئەو توانست و زانست و دانستە پێش‌چاو بخە، ئنجا لافی ئەوە لـێ بدە کە دەتوانیت من دروست بکەیت! دەنا برۆ لە پێش‌چـاومدا ون بـە، چونکـە خڕۆکـە سـوورەکانی خوێـن، ڕۆزی‌یـەکانم بـە دەسـت دەگەیـەنن و خڕۆکـە سـپی‌یەکانیش لـە دژی نەخۆشی‌یە هێرش‌بـەرەکان بـەرگریم لـێ دەکـەن. مـن گەلـێ ئیشـی گـەورەم لـە ئەستۆدایە، سەرقاڵم مەکە با ئەنجامیان بدەم، کۆڵـەوارێکی دەستەوسـانی کوێـری وەك تـۆ هـەرگیز مـافی خۆهەڵقورتاندنی لە کاروبارە وردەکانی ئێمەدا نی‌یە، چونکە ڕێسای ئێمـە هێنـدە مەحکـەم و کاملە[1] کە ئەگەر جگە لە خواوەندی خاوەن توانستی ڕەها کەسی تر حوکمڕانیمان بکـات

(١) کردگـاری دانـا جەسـتەی مرۆڤـی لـە شـێوەی شـارێکی یـەکجار ڕێکوپێکـدا بـەدی هێنـاوە، ئەوەتا بەشێك لـە دەمارەکان ئەرکی تەلەفۆن و تەلگرافیان گرتووەتە ئەستۆ و، بەشێکی دیکەشیان وەك ئەو لوولە و بۆری‌یانـە وان کـە ئاو لە سـەرچاوەکانەوە دەهێنـن و، خوێنیـان پێـدا دەڕوات، کـە شـلەمەنی‌یەکی وەهایـە مایـەی ژیانـە.. ئنجـا خـودی خوێنیـش دوو جـۆر خڕۆکـی تێـدا بـەدی هێنـراوە، بەشـێکیان پێـی دەوترێـت "خڕۆکـە سـوورەکان" کـە ئـەرکی دابەشکردنی ڕۆزی‌یان بەسەر خانەکانی لەشدا خراوەتە ئەستۆ. بەم پێیە و بە یاسایەکی خوایی ڕۆزی بـەو خانانـەی لـەش دەگەیـەنن و بـە وێنـەی کارمـەند و بازرگانـەکانی ئازووقـە بەسـەریاندا دابەشـی دەکـەن. بەشـەکەی تریشـیان "خڕۆکە سپی‌یەکان"ن کە ژمارەیان لەوانەی پێشوو کەمترە و بەرامبەر نەخۆشی‌یەکان بـەرگری لـە لـەش دەکـەن و، هەریەکەیان کـە دەچنـە جەنگەوە زۆر بـە خێرایی و وەك موریـدی تەریقـەتی مەولـەوی بـە دوو جـۆر جموجـووڵ و خولانەوە بارودۆخێکی سەرسووڕهێن دەگرنە خۆیان.

ئنجا سەرجەمی خوێنیش – بە گشتی – دوو کارمەندیی گشتیی لە ئەستۆدایە:

یەکەمیان: ئاوەدانکردنەوە و بنیاتنانەوەی خانە ڕووخاوەکانی لەش.

دووهەمیان: خاوێنکردنەوەی لەش، لە ڕێی کۆکردنەوەی پاشماوەی خانە ڕووخاوەکان.

هەروەها دوو جۆر دەمار لە لەشدا هەن، بە جۆرێکیـان دەوترێـت: "خوێنبـەرەکان" کـە خوێنـی سـاف و خـاوێن دەگوێزنەوە و دابەشی دەکەن و وەك لوولەی هێنانی خوێنی پوخت وان. جۆرەکەی تریان: لوولەی خوێنی چەپەڵە، کە پاشماوەی زیانبەخشی خانە ڕووخاوەکان کۆ دەکەنەوە و دەیانهێنن بۆ "سی" کە مەڵبەندی هەناسەدانە.

ئنجـا کردگـاری دانـا دوو توخـمی لـەناو هـەوادا دروسـت کـردووە، یـەکێکیان: ئـازوت و، ئـەوی تریـان: ئۆکسجینە. ئەم توخـمەی دوایی هەر هێندەی لە کاتی هەناسەداندا بەر خوێـن دەکـەوێت یەکسـەر ئەوکاربۆنـە چڕە کە خوێنی چەپەڵ کردبوو، بۆ لای خۆی ڕادەکێشـێت ئنجـا دەیکـات بـە ماددەیـەکی ژەهـراوی کـە پێـی دەوترێـت: "دووهـەم ئۆکسـیدی کـاربۆن". بـەم جـۆرە خوێـن پـاکژ و پاڵفتـە دەکـات، چونکـە کردگـاری دانـا پەیوەندی‌یـەکی توندوتۆڵی لە نێوان ئۆکسجین و کاربۆندا داناوە کە پێی دەوترێـت: "ئولفـەتی کیمیـایی" بـە ڕادەیـەك هـەر هێنـدەی لێك نزیك دەبنەوە، بە یاسـایەکی خوایی، تێکەڵی یـەکتری دەبـن و، هـەروەك زانسـت چەسـپاندوویەتی لـەم تێکـەڵ بوونەوە گەرمی بەرهەم دێت. چونکە تێکەڵ بوون جۆرێکە لە سووتاندن. حیکمەتی ئـەم نهێنی‌یـەش بریتی‌یـە لـەوەی

ئه‌وا ڕێسای ئێمه تێك ده‌چێت و ملوانكه‌كه‌شمان ده‌بچڕێته‌وه.

بەم جۆره، بابای لاف لێده‌ر له "خانه"ش نائومێد بوو. ناچار ڕووی له "جه‌سته‌ی مرۆڤ" كرد و، وه‌ك مادديیه‌كان به زمانی سروشتی كتوكوێر و فه‌لسه‌فه‌ی ڕێ لێ ونكه‌ر، وتی:

– تۆ موڵكی منیت. من تۆم دروست كردووه، یان به‌لای كه‌مه‌وه به‌شێكم له تۆدا هه‌یه!

جه‌سته‌ی مرۆڤیش، به زمانی حه‌قیقه‌تی ئه‌و ڕێسا سه‌رتاپا دانسته‌ی كه تیایدایه، به‌رپه‌رچی دایه‌وه و، پێی وت:

– ئه‌گه‌ر تۆی لاف لێده‌ر خاوه‌نی زانستێكی فراوان بیت و، توانستێكی هه‌مه‌لایه‌نه‌ی ئه‌وتۆ شك ده‌به‌یت كه بتوانێت به چه‌شنێكی ڕه‌ها و سه‌ربه‌ست ده‌ستكاریی جه‌سته‌ی هه‌موو مرۆڤه هاوچه‌شنه‌كانی من بكات و، ئه‌و نیشانه ئاشكرا و جوداكه‌ره‌وانه‌ش له ده‌موچاوی هه‌مووماندا دابنێت كه ته‌مغه‌ی توانست و مۆری فیتره‌تن.. هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر خاوه‌نی سامانێكی یه‌كجار زۆر و فه‌رمانڕه‌وایه‌تییه‌كی زاڵ و به‌ده‌سته‌ڵاتی ئه‌وتۆیت كه گه‌نجینه‌كانی ڕۆزیی منی به‌ده‌ست بێت، ئه‌وانه‌ی كه هه‌ر له هه‌وا و ئاوه‌وه تا ده‌گاته ڕووه‌ك و زینده‌وه‌ران، ده‌گرنه‌وه. هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر خاوه‌نی دانستێكی بێ‌سنوور و توانستێكی نه‌براوه‌ی وه‌هایت كه به هۆیانه‌وه بتوانیت لایه‌نه مه‌عنه‌وییه ناسك و نیان و به‌رز و فراوانه‌كانی چه‌شنی: "گیان" و "دڵ" و "ژیری" له بۆته‌ی له‌شێكی بچووكی وه‌ك مندا دابنێیت و، به حیكمه‌تێكی له‌ڕاده‌به‌ده‌ر به‌ره‌و به‌ندایه‌تی بیانخه‌یته ڕێ، ئه‌وا فه‌رموو هه‌موو ئه‌مانه‌م پیشان بده، ئنجا لافی په‌روه‌ردگاری و خاوه‌نێتیی من لێ‌بده! ده‌نا بۆ خۆت بێ‌ده‌نگ به، چونكه كردگاری مه‌زنی من، به شایه‌تیی ئه‌و ڕێسا هه‌ره كامڵه‌ی كه منی پێ به‌ڕێ ده‌خات و به به‌ڵگه‌ی ئه‌و مۆری یه‌كتایی‌یه‌ی كه له ده‌موچاومدا دایناوه، ده‌سته‌ڵاتی به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا هه‌یه و ئاگای له هه‌موو شتێكه و هه‌موو شتێك ده‌بینێت، هه‌رگیز كۆڵه‌وار و گومڕایه‌كی وه‌ك تۆ ناتوانێت په‌نجه بۆ ناو سنعه‌ته ناوازه‌كه‌ی ئه‌و درێژ بكات یان به ئه‌ندازه‌ی

---

كه: گه‌ردیله‌كانی هه‌موو یه‌كێك له توخمه‌كان چه‌ند جموجوولێكی جیاجیایان هه‌یه، جا له كاتی تێكه‌ڵ بوونی ئه‌و توخمانه‌دا جووڵه‌كانیشیان تێكه‌ڵ ده‌بێت و به هه‌ردوو گه‌ردیله‌كه یه‌ك جووڵه‌یان ده‌بێت، ئه‌م جووڵه‌یه‌ش هه‌روا به سه‌ربه‌ستی‌ده‌مێنێته‌وه و به یاسای كردگاری دانا له شێوه‌ی گه‌رمی‌دا ئه‌و جووڵه‌یه ده‌رده‌چێت. ئاشكرایشه كه وه‌ك له زانستدا چه‌سپاوه: جووڵه گه‌رمی به‌رهه‌م ده‌هێنێت.

جا له‌سه‌ر بناغه‌ی ئه‌م نهێنی‌یه: هه‌روه‌ك گه‌رمیی غه‌ریزه‌یی(سروشتی)ی له‌ش به‌م تێكه‌ڵ بوونه كیمیایی‌یه دێته‌دی، خوێنیش له‌م ڕێیه‌وه پاڵفته ده‌بێت، كاتێ كاربۆنی لێ لاده‌برێت.

به‌م جۆره، هه‌ناسه هه‌ڵمژین ئاوی ژیانی له‌ش(خوێن) پوخت و پاڵفته ده‌كات و ئاگری ژیانی تێدا داده‌گیرسێنێت. به‌ڵام هه‌ناسه‌ده‌ردان ئه‌و وشه و گوفتارانه له ڕێی ده‌مه‌وه به‌رهه‌م ده‌هێنێت كه موعجیزه‌ی توانستی خواوه‌ندن. فسبحان من تحيّرَ في صنعه العقول! (دانه‌ر)

گەردیلەیەکیش خۆی تێدا هەڵبقورتێنێت!

نوێنەری ئەهلی شیرك کە هیچ جێگایەکی لـە "لەشی مرۆڤ"دا نەدۆزیـیەوە خۆی تێدا هـەڵبقورتێنێت، ناچـار وازی لـەو لەشـە هێنـا و ڕووی لـە "ڕەگـەزی مـرۆڤ" کـرد و، لەبـەر خۆیەوە بە خۆی وت: لەوانەیە لە نێوان ئەم کۆمەڵە تێکەڵوپێکەڵ و پەرتەوازەیەدا جێیەك بۆ خۆم پەیدا بکەم و لە بارودۆخی سروشت و "بوون"یاندا دەست تێوەردانێك ساز بدەم، بە وێنـەی "شـەیتان" کـە بـە گومڕاییەکـەی خـۆی دەسـت لـە کاروبـاری ئیختیـاری و کۆمەڵایەتییاندا وەردەدات، ئەو کاتە دەتوانم دەستەڵات و فەرمانڕەوایەتی بەسەر جەستەی مرۆڤدا جێبەجێ بکەم کە هەر ئێستا خۆی و خانەکانی دەریان کردم.

بۆ ئەم مەبەستە، ڕووی لە "بەرەی مرۆڤ" کرد و، بە هەمان زمانی سروشـتی کـەڕ و کاس و فەلسەفەی گومڕا، پێی وتن:

- ئێـوەی مـرۆڤ لـە بـارودۆخێکی شـڵەژاوی هەرەمـەکی و بـێ ڕێسـادان، وا مـن پەروەردگار و خاوەنتانم، هیچ نەبێ بەشێکم لە ئێوەدا هەیە.

یەکسـەر "ڕەگـەزی مـرۆڤ" بـە زمـانی حـەق و حەقیقـەت و دانسـت و ڕێکوپێکـی، بەرپەرچی دایەوە و وتی:

- ئەگـەر تۆی لاف لێدەر خـاوەنی توانسـتێکی ئـەوتۆ بیـت کە بـە هۆیـەوە پۆشـاکێکی جـوان و ڕەنگـاوڕەنگی وا بکەیتە بـەر گـۆی زەوی کـە بـە کـەماڵی حیکمـەت و بە دەزووی جۆرەهای ڕووەك و زیندەوەران چنرابێت لەوانەی کە لە سەد هەزار جۆر زیـاتر دەبـن و وەك ڕەگـەز و جـۆری ئێمـەی مـرۆڤ وان.. هـەروەها ئەگـەر خـاوەنی توانسـتێکی وەهـایت کـە بتوانێت ئەو ڕایەخە ناوازەیەی ڕووی زەوی بە سەدان هەزار جۆری زینـدەوەران بچنێـت کـە لە جوانترین و ناوازەترین نەخش و نیگاردا چنراوە.. ئنجـا سـەرەڕای بەدیـهێنانی ئـەم ڕایەخـە ڕەنگینـە، بیشـتوانیت هەمیشـە و بـەردەوام بـە حیکمـەتێکی تـەواو تازەشـی بکەیتـەوە! گـەر توانستێکی گشتگیرت هەیە و دانسـتێکی هەمەلایەنـەی وەك ئەمـە شـك دەبـەیت بە چەشـنێك بتوانێـت دەستکاریی ئێـش و کـاری ئـەم گـۆی زەوییـە بکـات کـە ئێمـە هـەندێکین لـە بەروبوومەکانی، پاشان کاروباری ئەم جیهانەش بسـازێنێت کـە ئێمـە تۆوەکـانی ئـەوین و، بە تەرازووی "دانـایی" پێداویستییەکانی ژیانمـان لـە هـەموو گۆشـە و هـەرێمێکی جیهانـەوە بۆ بنێرێت.. هەروەها گەر توانستێکی وەهات هەیە بتوانێت نیشـانەکانی توانستی خـواوەنـد کـە وەك یـەك وان و نیشـانەی جوداکـەرەوەن لـە دەموچـاوی ئێمـە و هاوڕەگـەزەکانمان هـەر لـە پێشینانەوە تا نەوەکانی ئاینده، دابنێـت..

ئەگەر تۆ خاوەنی هەموو ئەمانەیت، ئەوا لەوانەیە مافی لاف لێدانی پەروەردگاری و خاوەنێتیی "من" بەدەست بهێنیت. دەنا لاڵ بە و مەڵێ: دەتوانم خۆم لە کاروباری ئەوانەدا هەڵبقورتێنم کە لە بارودۆخێکی تێکەڵوپێکەڵ و هەرەمەکی‌دا دەردەکەون! نەخێر، چونکە ڕێسا و ڕێکوپێکیی ئێمە لە تەواوترین شێوەدایە. ئەو بارودۆخانەش کە تۆ بە بەربادی و هەرەمەکێتی‌یان دەزانیت، لە ڕاستی‌دا کاری لەبەرنووسینەوە و لەبەرگرتنەوەیە کە توانستی خوایی، بەوپەڕی ڕێکوپێکی، شتان بەپێی قەدەری خوای گەورە دەنووسێتەوە و لەبەریان دەگرێتەوە. خۆ ئەگەر لە نزمترینی پلەکانی ژیاندا، کە هی ڕووەك و زیندەوەرانە، ڕێسا هێندە ورد بێت بوار بە هیچ دەستتێوەردانێك نەدات، دەبێ ڕێسای ئێمە چۆن بێت کە لە چڵەپۆپەی پلەکانی ژیانداین؟ ئایا ئەو شتەی کە بە ڕواڵەت هەرەمەکی و تێکەڵوپێکەڵ دیارە، جۆرە نووسینێکی دانایانەی پەروەردگار نی‌یە؟

ئایا دەگونجێ ئەو کەسەی کە تاڵی تان و پۆی نەخش و نیگاری ناوازەی ئەم ڕایەخەی هەریەك لە جێی شیاوی خۆی لە هەموو لایەکی ئەو ڕایەخەدا داناوە، کەسێکی تر بێت جگە لە کردگار و بەدیهێنەری ڕاستەقینەی خۆی؟

ئایا دەگونجێ بەدیهێنەری "ناوك" کەسێکی دیکەی جگە لە بەدیهێنەری "بەر" بێت؟ یان بەدیهێنەری "بەر" کەسێکی تری غەیری بەدیهێنەری "درەخت"ەکە بێت؟

بەڵام دیارە تۆ کوێر و نابینایت، ئەوەتا موعجیزاتی توانست لە دەموچاومدا و کارە دەراساکانی سنعەت لە بەدیهاتنمدا نابینیت! خۆ ئەگەر بتبینینایە ئەوا هەستت دەکرد کە بەدیهێنەری من هیچ شتێکی لێ ون نابێت و چ کارێکی بەلاوە قورس و گران نی‌یە و بەرامبەر هیچ شتێك دەستەوسان نی‌یە و، ئەستێرەکان بە ئەندازەی ئاسانیی بەڕێوەبردنی گەردیلەکان بەڕێوەدەبات و بەهاری فراوانیش بە وێنەی ئاسانیی بەدیهێنانی تەنها یەك گوڵ بەدی دەهێنێت. هەر ئەو بەدیهێنەرەیە پێڕستی ئەم گەردوونە مەزنەی بەوپەڕی ڕێکی و وردی لە ماهییەتی مندا داناوە. ئایا ئیتر دەستەوسانێکی کوێری وەك تۆ چۆن دەتوانێت خۆی هەڵبقورتێنێت و دەست لە داهێنانی ناوازەی ئەم بەدیهێنەرە مەزن و کردگارە شکۆمەندە وەربدات؟! لەبەر ئەوە، بێدەنگ بە و برۆ لە بەرچاومدا مەمێنە!

بەم جۆرە لەوێ دەری دەکات!

پاشان ڕۆشت بۆ لای ئەو ڕایەخە ڕەنگینەی کە بەسەر ڕووی زەوی‌دا ڕاخراوە و، ئەو پۆشاکە قەشەنگ و ڕازاوەیەی کراوەتە بەری و، بە ناوی هۆکارەکان و بە زمانی سروشت و فەلسەفە پێی وت:

– من دەتوانم دەست لە کاروبارت وەربدەم، کەواتە من خاوەنی تۆم. هیچ نەبێ بەشێکم لە تۆدا هەیە.

ئالێرەدا ڕایەخە ڕەنگین و پۆشاکە قەشەنگ و ڕازاوەکە[1] لەو لاف لێدەرە ڕاپەڕی و، بە زمانی ئەو ڕاستی و دانستانەی تیایدا حەشار دراون، وەڵامی دایەوە و وتی:

- ئەگەر تۆ خاوەنی توانستێکی کاریگەر و وردەکاری و داهێنانێکی ناوازەی ئەوتۆیت کە لە ڕێیانەوە بتوانیت سەرجەمی ئەو ڕایەخ و پۆشاکە جوانانە بچنیت کە بە ئەندازەی ژمارەی چەرخ و ساڵەکان دەکرێنە بەر زەوی، پاشان بە ڕێسایەکی ڕێك و تەواو لەبەری دابماڵیت و بەسەر تەنافی زەمانی ڕابوردوودا هەڵیان بخەیت، ئنجا ئەو پۆشاکە ڕەنگینانەی بەری زەوی بە نەخش و نیگارەکانیانەوە بدووریت و لە بازنەی قەدەردا تەصمیمەکانیان ببڕیت و ئامادەیان بکەیت..

هەروەها ئەگەر خاوەنی دەستێکی مەعنەویی دانا و بەتوانای وەها بیت کە بگاتە هەموو شتێك هەر لە سەرەتای دروست بوونی زەوییەوە هەتا ڕووخان و کاول بوونی، تەنانەت هەر لە ئەزەلەوە بۆ ئەبەد، ئیتر بەو پێیە یەكبەیەکی تاڵەکانی تان و پۆی زەوی بە بەردەوامی بگۆڕیت و نوێیان بکەیتەوە.. هەروەها ئەگەر بتوانیت جڵەوی ئەم گۆی زەوییە زەبەلاحە بە دەستەوە بگریت کە ئێمە دەپۆشێت و دەمانکاتەبەر..

بەڵێ، ئەگەر بەم جۆرەیت و ئەم توانایەت هەیە، ئەوا لافی پەروەردگاریتی و خاوەنێتیی من لێ بدە! دەنا بڕۆ بە ڕسوایی و دەرکراوی زەوی بەجێ بهێڵە، جێگەت لێرەدا نابێتەوە، چونکە ئێمە هێندە درەوشانەوەی "یەکتایی" و مۆری "تەنیایی"مان تێدایە کە ئەگەر کەسێك سەرجەمی بوونەوەران لە دەستی توانستیدا نەبێت و لە یەك کاتدا و بە یەك جار هەموو شتێك بە هەموو کاروبارێکیانەوە نەبینێت و نەتوانێت لە یەك کاتدا گەلێ ئیش و کاری لە سنوور بەدەر ئەنجام بدات و ئامادە و چاودێری هەموو شوێنێك نەبێت و لە کات و شوێنیش دوور و خاوێن نەبێت، هەرگیز ناتوانێت خاوەنی ئێمە بێت. تەنانەت هەر ناشتوانێت خۆی لە کاروباری ئێمەدا هەڵبقورتێنێت!

واتە ئەو کەسەی خاوەنی توانست و دانست و زانستی ڕەها نەبێت ناتوانێت فەرمانی خۆیمان بەسەردا بسەپێنێت و خۆی بە خاوەنی ئێمە لە قەڵەم بدات!

ناچار ئەم لاف لێدەرە لەبەر خۆیەوە بە خۆی وت: با بڕۆم بۆ لای "گۆی زەوی" بەڵکو بیخلافێنم و جێگایەکی تێدا بدۆزمەوە بۆ خۆم.. بۆیە ڕووی لە "زەوی" کرد و بە ناوی

---

(١) هەروەك ئەم تان و پۆ چنراوە تان و پۆیەکی زیندەیە، لە هەمان کاتدا لە ئاڵوگۆڕ و جموجووڵێکی بەردەوامدایە. چونکە هەمیشە نەخش و نیگارەکانی بە حیکمەتێکی کامڵ و ڕێکوپێکییەکی تەواو دەگۆڕڕێن و نوێ دەبنەوە، بۆ مەبەستی دەرخستنی درەوشانەوە جوانەکانی ئەو کەسەی کە وا بە ناوازەیی چنیونی و دایهێناون. (دانەر)

هۆكاره‌كان و به‌ زمانی سروشت جارێكی تر پێی وته‌وه[١]:

– ئه‌م خولانه‌وه‌ بێ ئامانجه‌ت وا پیشان ده‌دات كه‌ تۆ به‌ره‌ڵا و بێ خاوه‌ن بیت. كه‌واته‌ ده‌كرێت له‌ ژێر فه‌رمانی مندا بیت!

یه‌كسه‌ر "گۆی زه‌وی" به‌ هاوارێكی وه‌ك هی نه‌عره‌ته‌ی هه‌وره‌ بروسكه‌ چوو به‌ گژی‌دا و، به‌ زمانی حه‌ق و ڕاستیی ناو خۆی ئینكاریی داواكه‌ی ئه‌وی كرد و، پێی وت:

– ئه‌ی گه‌وجی نه‌فام! چه‌نه‌بازی مه‌كه‌! من چۆن به‌رباد و بێ خاوه‌ن ده‌بم؟! چونكه‌ ئایا له‌و پۆشاكه‌ی به‌رمدا ته‌نها یه‌ك تاڵی نامۆی بێ دانایی و بێ ورده‌كاری ده‌بینیت تا پێت وا بێت من بێ خاوه‌ن بم؟! هیچ نه‌بێ ته‌نها سه‌یری جموجوڵه‌كانم بكه‌، كه‌ یه‌كێكیان بزووتنی ساڵانه‌مه‌ و به‌ هۆیه‌وه‌ ماوه‌ی بیست و پێنج هه‌زار ساڵ ڕێ ده‌بڕم و[٢]، ئه‌ركه‌كانی سه‌رشانم به‌ كه‌ماڵی میزان و دانایی ئه‌نجام ده‌ده‌م. جا ئه‌گه‌ر تۆ دانست و توانستێكی ڕه‌ها له‌ خۆتدا شك ده‌به‌یت و ده‌توانیت به‌ هۆیانه‌وه‌ خۆم و ده‌ هه‌ساره‌ گه‌ڕۆكه‌كانی هاوچه‌شنم له‌ خولگه‌ مه‌زنه‌كانماندا به‌ڕێ بخه‌یت و هه‌ڵیان بسووڕێنیت، هه‌روه‌ها ئه‌و خۆره‌ ڕووناكی به‌خشه‌ش به‌دیبهێنیت كه‌ پێشه‌وامانه‌ و ڕاكێشه‌ر(جاذبة)ی میهره‌بانی به‌ یه‌كه‌وه‌ په‌یوه‌ستمان ده‌كات و، من و هه‌ساره‌كانی تر پێكه‌وه‌ به‌ ڕێسایه‌كی ته‌واوه‌تی و دانستێكی كامڵ به‌ ده‌وری خۆردا ده‌سووڕێنێت..

به‌ڵێ، ئه‌ی بابای لاف لێده‌ر! ئه‌گه‌ر توانست و دانستێكی ڕه‌های وه‌ك ئه‌مه‌ت هه‌یه‌ كه‌ بتوانێت ئه‌م هه‌موو كاروباره‌ گه‌وره‌ و گرنگانه‌ ڕاپه‌ڕێنێت و بیانسازێنێت، ئه‌وا ئه‌و لافه‌ لێ بده‌! ده‌نا واز له‌م چه‌نه‌بازی‌یه‌ زیاد له‌ پێویسته‌ بهێنه‌ و بڕۆ بۆ دۆزه‌خ و سه‌رقاڵم مه‌كه‌ با خه‌ریكی ئه‌نجامدانی ئه‌ركه‌ گرنگه‌كانم بم. چونكه‌ ڕێكوپێكیی ڕه‌نگین و، ورده‌كاری و هاوچه‌شنیی به‌سام و شكۆ و، گوێڕایه‌ڵیی سه‌رتاپا حیكمه‌تی ئێمه‌ – به‌ ئاشكرا – به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌: هه‌موو بوونه‌وه‌ران، هه‌ر له‌ گه‌ردیله‌كانه‌وه‌ تا ده‌گاته‌ ئه‌ستێره‌ و

---

(١) به‌ پوختی: "گه‌ردیله‌" ئه‌و لاف لێده‌ره‌ ڕه‌وانه‌ی "خڕۆكی سوور" ده‌كات و، ئه‌ویش حه‌واڵه‌ی لای "خانه‌"ی ده‌كات و، ئه‌ویش بۆ لای "جه‌سته‌ی مرۆڤ" ده‌ینێرێت و، ئنجا ئه‌ویش بۆ لای "ڕه‌گه‌زی مرۆڤ" به‌ڕێی ده‌كات و، ڕه‌گه‌زی مرۆڤیش بۆ لای ئه‌و "پۆشاكه‌ چنراوه‌" زیندووه‌ی ده‌نێرێت كه‌ گۆی زه‌وی ده‌یكاته‌ به‌ر و، ئه‌م پۆشاكه‌ش حه‌واڵه‌ی لای خودی "زه‌وی"ی ده‌كات و، زه‌وییش بۆ لای "خۆر" و، خۆریش بۆ لای "ئه‌ستێره‌كان" ده‌ینێرێت.. به‌م جۆره‌ هه‌موو یه‌كێك له‌وان پێی ده‌ڵێن: بڕۆ وازمان لێ بهێنه‌. چونكه‌ ئه‌گه‌ر بتوانیت به‌سه‌ر ئه‌وانه‌ی له‌ ژوور خۆمه‌وه‌ن زاڵ بییت ئه‌وا هه‌وڵی زاڵ بوونیش به‌سه‌ر مندا بده‌. ده‌نا تۆ هێنده‌ ده‌سته‌وسانیت كه‌ ناتوانیت فه‌رمانی خۆتم به‌سه‌ردا بسه‌پێنیت. كه‌واته‌ ئه‌و كه‌سه‌ی نه‌توانێت فه‌رمانی خۆی به‌سه‌ر هه‌موو ئه‌ستێره‌كاندا جێبه‌جێ بكات، ناتوانێت به‌سه‌ر ته‌نها یه‌ك گه‌ردیله‌شدا جێبه‌جێی بكات! (دانه‌ر)

(٢) ئه‌گه‌ر نیوه‌تیره‌ی بازنه‌یه‌ك (١٨٠ ملیۆن كم) بێت، ئه‌وا ماوه‌ی ئه‌و بازنه‌یه‌ نزیكه‌ی بیست و پێنج هه‌زار ساڵ ڕێ ده‌بێت! (دانه‌ر)

خۆرەکان، گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانی بەدیهێنەرمانن. ئەوەتا بەدیهێنەر هەروەك بەوپەڕی ئاسانی درەخت ڕێك دەخـات و بەروبوومـەکانی دەرازێنێتـەوە، بـە هـەمان ئاسـانی، خۆریـش لەگەڵ هەسارەکانی‌دا ڕێك دەخات و دەیانهۆنێتەوە. کەواتە بەدیهێنەرمان دانای شکۆمەند و فەرمانڕەوای موتڵەق و خاوەن کەماڵە.

پاشـان ئـەم لاف لێـدەرە دوای ئـەوەی کـە تەنانـەت جـێ پێ‌یەکیشـی لـە گـۆی زەوی‌دا نەدۆزی‌یەوە، ڕووی لە "خۆر" کرد و لەبەر خۆیەوە وتی: ئـەم خـۆرە شتێکی مەزنـە، بەشـکو کـەلێنێکی تێـدا بدۆزمـەوە جێـی ئـەم داوایـەمی تێـدا بکەمـەوە و، ئنجـا بتـوانم گـۆی زەویـش ملکەچ بکەم!

بۆیـە بـە زمـانی شـیرك و شـێوازە گومڕاییـ‌یەکانی فەلسـەفەی شـەیتانی و بـە وێنـەی مەجووسەکان، پێی وت:

– ئەی خۆر! تۆ پادشای جیهانیت، بێ هیچ گومانێك خاوەنی خۆتیت و بە ویستی خۆت هەڵسوکەوت لە جیهاندا دەکەیت.

یەکسەر "خۆر" لێی ڕاپەڕی و بە زمانی حەق و ڕاستی وەڵامی دایەوە:

– نەخێر، هەزار جار نەخێر.. من تەنها کار بێ‌سپێرراوێکی گوێڕایەڵم، ئەرکی ڕوونـاك کردنەوەی میوانخانەی گەورەکـەمم لـە ئەسـتۆ نـراوە. هـەرگیز خـاوەنی خـۆم نیـم، تەنانـەت خاوەنی ڕاستەقینەی باڵە مێشـێکیش نیـم. چونکـە هێنـدە گەوهـەری مەعنـەویی بـەنرخی وەك چاو و گوێ و ناوازەیی سنعەت لە جەستەی مێشدا هەن کە من شکیان نابەم و لـە سـەرووی توانای منەوەن.

بەم جۆرە، ئەو لاف لێدەرەی تەریق کردەوە.

ئەویش بە زمانی فەلسەفەی لەخۆبایی فیرعەون ئاسا، پێی وت:

– مادەم تۆ خاوەنی خۆت نییت و خزمەتگوزاریت، ئەوا بەندە و موڵکی منیت و بە نـاوی هۆکارەکانەوە لە ژێر دەستەڵاتی مندایت!

خۆریش زۆر بە توندی بەرپەرچی دایەوە و بە ناوی حەق و ڕاستی و بە زمانی "بەندایەتی" پێی وت:

– من بەندە و موڵکی کەسێکم کـە چەندەها ئەسـتێرەی بـەرزی هـاووێنەی منـی بـەدی هێنـاوە و بـە کـەماڵی دانـایی لـە ئاسـماندا دایـناون و بـە کـەماڵی سـام و شـکۆش هـەڵیان دەسـووڕێنێت و بە کەماڵی ڕازاندنەوەش ئارایشتی داون.

پاشـان ئـەو لاف لێـدەرە لەبـەر خۆیـەوە بـە خـۆی وت: "ئەسـتێرەکان" تێکەڵوپێکـەڵ و جەنجاڵن و، لە هەمان کاتیشدا پەرتەوازە و لە یەکتری‌یەوە دوورن، بـەڵکو بـە نـاوی ئەوانـەی

كە من وەكیلیانم جێگایەك بۆ خۆم پەیدا بكەم و شتێك بەدەست بهێنم! بەم جۆرە ڕۆشتە ناو ئەستێرەكان و بە وێنەی ئەستێرە پەرستەكان(صابیئین) و بە ناوی هۆكارەكان و لە پێناوی هاوبەشەكانی‌دا و بە زمانی فەلسەفەی لەخۆبایی، پێی وتن:

- ئەی "ئەستێرەكان"! ئێوە هێندە پەرتەوازە و بڵاون كە چەند فەرمانڕەوایەكی زۆر فەرمانی خۆیان بەسەرتاندا دەسەپێنن.

یەكسەر تەنها یەك ئەستێرە بە ناوی هەموویانەوە، وەڵامی دایەوە:

- ئەی گەوجی لاف لێدەر! چەندە گێژ و نەفامیت! ئایا نیشانەی "یەكتایی" و مۆری "تەنیایی" بەسەر ڕوومانەوە نابینیت؟ یان ئایا لێیان تێ ناگەیت؟ ئایا لە ڕێسا بەرزەكانمان و یاسا توند و تیژەكانی بەندایەتیمان ئاگادار نیت؟ وا بە بێ ڕێسامان دەزانیت؟..

ئێمە هەمووومان بەندە و بەدیهاتووی كەسێكی تاك و تەنیای ئەوتۆین كە جڵەوی كاروباری ئاسمانەكان - كە دەریای ئێمەیە - و جڵەوی بوونەوەرانیش كە درەختەكەمانە و بۆشایی(فضاء)ی ئەم جیهانە فراوانەش كە شوێنی هاتوچۆمانە، لە دەستی ئەودایە..

ئێمە چەند شایەتێكی نوورانیی وەك چرا و گڵۆپە ڕووناكیبەخشەكانی ڕۆژانی فیستیڤاڵەكان واین، كەماڵی پەروەردگارێتیی خوا دەردەخەین و، چەند بەڵگەیەكی درەخشانین، دەستەڵاتداریی پەروەردگارێتیی خواوەند ڕادەگەیەنین و، هەموو چین و تاقمێكی ئێمە خزمەتگوزار و كارمەندی نوورانیین. ئێمە لە سەرجەمی مەنزڵگا بەرز و نزم و دنیایی و بەرزەخی و قیامەتی‌یەكاندا، دەبین بە بەڵگەی مەزنێتیی دەستەڵاتدارێتیی خوای گەورە.

بەڵێ، ئێمە یەكێكین لە موعجیزاتی توانستی خواوەندی تاك و تەنیا و بەرێكی پێگەیشتووی درەختی بەدیهاتووان و بەڵگەیەكی ڕووناكیبەخشی وەحدانییەتین.. ئێمە مەنزڵگا و فڕۆكە و مزگەوتی مەلائیكەتان و، چرا و خۆری جیهانە بەرزەكانین و، شایەتی دەستەڵاتی پەروەردگارێتیی خوای گەورەین و، ئارایشت و گوڵی كۆشك و بۆشایی ئەم جیهانەین. دەڵێی چەند ماسی‌یەكی نوورانیی وەهاین كە لە دەریای ئاسماندا مەلە بكەین و، بە وێنەی چاوێكی جوانی ڕووی ئاسمانین(١).

---

(١) ئێمە بینەر و ئاماژەبۆكەری بەدیهاتووە ناوازەكانی بەدیهێنەرین، بەڵكو كارێك دەكەین كە غەیری خۆشمان بە سەرسووڕمانەوە بیانبینن. واتە دەڵێی ئاسمانەكان بە چەندەها چاوی لە ژمارەبەدەر سەیری لایەنە سەرسووڕهێنەكانی سنعەتی خوا لە زەوی‌دا دەكەن. كەواتە ئەستێرەكان وەك مەلائیكەتەكانی ئاسمان دەڕواننە ئەو زەوی‌یەی كە كۆگای شتانی سەیر و پیشانگای نامۆ و سەرسووڕهێنن، تەنانەت سەرنجی خاوەن هەستانیشی بۆ لا ڕادەكێشن. (دانەر)

جا هەروەك هـەموو یـەكێكمان بەم جۆرەین، ئـەوا لـە كـۆی هـەمووشماندا: بێدەنگی لـە دۆخـی نەبزوانـدا و، جموجـووڵ لـە نـاوەندی دانسـتـدا و، ئارایشـت لـە نێـوان سـام و شـكۆدا و، تـەواویی بەدیـهاتن لـە نـاوەندی ڕێكوپێكـیدا و، وردەكـاریی سنعەت لـە نێـوان هاوسەنگیدا، دەردەكەوێت. بۆیە ئێمە بە چەندەها زمانی بێ سنوور، شـایەتی لەسـەر: تـاك و تەنیایی و صەمەدانییەت و سەرجەم وەسفەكانی جوانی و شكۆمەندی و كـەماڵی بەدیهێنـەری مەزنمان دەدەین و، ئەم شایەتییەشمان لە پێش‌چاوی سەرانسەری بوونەوەراندا ڕادەگەیەنین.

ئایـا هێشتا، دوای هـەموو ئەمانـە، ئێمـەی بـەندەی خـاوێن و گوێڕایـەڵ و ملكـەچ بـە: "بەربادی" و "هەرەمەكێتی" و "تێكەڵ و پێكەڵی" و "بێ مەبەستی" تەنانەت "بێ خـاوەنی"یـش تۆمەتبار دەكەیت؟ بێ گومان لەسەر ئەم تۆمەتە شایانی تەمێ كردنیت!

بـۆیە یـەكێك لـەو ئەسـتێرانەیان وەك تـیر گـرتە ئـەو لاف لێـدەرە و هـەڵیاندایە بنكـی دۆزەخـەوە و، سـروشـت و بانگەوازكارانی سـروشـتیشیان لەگـەڵدا هاویشـتە شـیوی وەهمەكان و[1] و ڕێكەوتیش فڕێ درایە بیری عەدەم و هاوبەشەكانیش هەڵدرانە تاریكستانی نەگونجاوی و مەحاڵییـەوە و فەلسـەفەی دژی ئـایینیش بـۆ بنكـی "أسـفل سـافلین".. ئیـتر ئـەو ئەستێرەیە لەگەڵ ئەستێرەكانی تردا پێكەوە ئایەتی پیرۆزی: ﴿**لَوْ كَـانَ فيـهِما آلِهَـةٌ إلاّ اللهُ لَفَسَدَتا**﴾یان خـوێنـدەوە و، ڕایـانگـەیاند كە بـوار بـە هیـچ هـاوبەشـێك نـادرێت و بـۆی نییـە دەست لە بچووكترین شت وەربدات، هەر لە باڵی مێشەوە تا دەگاتە چرای ئاسمان!

﴿**سُبحانكَ لا عِلْمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنتَ العليمُ الحكيمُ**﴾.

اللهمَ صلِّ وسلم على سيدنا محمد سراج وحدتك في كثرة مخلوقاتك ودلاّل وحدانيتـك في مشهر كائناتك وعلى آله وصحبه أجمعين.

* * *

---

(١) دوای ئەوەی سروشت لـەوێوە كەوتـە خـوارەوە، لـەو كـردارەی خـۆی تۆبـەی كـرد و پەشـیمان بـووەوە و، تێ گەیشت كە: ئەركی ڕاستەقینەی سەرشانی خۆی: قبووڵ‌كردن و كار تێدا كردنە، نەك كاریگـەری و كـاركردن. هەروەها زانیی كە: بەپێی توانست و ویستی خوای گەورە كار دەكات و وەك دەفتەری قەدەری خـوای گـەورە وایـە كە ئاڵوگۆڕی تێدا دەكرێـت و بـە وێنـەی پرۆگرامێكی توانستی پەروەردگارییـە و، جۆرێكـی شـەریعەتی فیـترییی خواوەندی بەتوانای شكۆمەندە و كۆمەڵـە یاساكانی ئـەوە. ئیـتر سروشـت بـە ئەركەكـەی سەرشـانی ڕازی بـوو كـە بریتییە لە بەندایەتی بە كەماڵی كۆڵەواری و ملكەچی بۆ خوای گەورە و، خۆی نـاو نـا: فیـترەتی ئیلاهـی و سنعەتی پەروەردگار. (دانەر)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿فانْظُرْ إلى آثار رحـــمتِ الله كيفَ يُحْيِ الأَرضَ بعدَ مَوْتِها﴾ (الروم: ٥٠)

ئەم بڕگە عەرەبیيە ئاماژە بۆ تەنها يەك دانە گوڵ لە باخی ئەزەلیی ئەم ئايەتە پيرۆزە دەكات:

حتّى كأنَّ الشجرة الْمُزَهَّرَة: قصيدةٌ منظومةٌ مُحَرَّرَة.. وتُنْشِدُ للفاطِرِ المدائحَ الْمُبهَّرَة.

أو فتحتْ بكثرةِ عيونَها الْمُبَصَّرة.. لِتَنظُرَ للصانعِ العجائبَ الْمُنَشَّرة.

أو زيَّنَتْ لعيدِها أعضاءها الْمُخَضَّرة.. لِيَشْهَدَ سُلْطانُها آثـــارَهُ الْمُنَـــوَّرة.. وتَشـــهَرَ في الْمَحضَرِ مُرَصَّعاتِ الجَوهرِ.. وتُعْلِنَ للبَشَرِ حكمةَ خلْقِ الشَجَرِ.. بِكنــزها الْمُدَخَّرِ من جودِ ربِّ الثَّمَرِ.

سُبحانَهُ ما أحسنَ إحسانَهُ!

ما أزينَ بُرهانَهُ!

ما أبينَ تِبْيانَهُ!

خيال بيند ازين اشجار ملائك را

جسد آمد سماوى با هزاران نى

ازين نيها شنيدت هوش:

ستايشهاى ذات حى.

ورقهارا زبان دارند.. همه "هو هو" ذكر دارند

بدر معناى: "حى .. حى"

چو "لا إله إلا هو"..

برابر ميزند هر شى.

دمادم جويدند "ياحق".. سراسر گويدند: "يا حى"!

برابر ميزنند: "أللّه".

﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكاً﴾ (ق:٩).

* * *

# پاشکۆیەکی بچووك

## بۆ هەڵوێستی یەکەم

گوێ لەم ئایەتە پیرۆزە ڕابگرە:

﴿أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلى السَّماءِ كَيْفَ بَنَيْناها وزَيَّنّاها...﴾

تا کۆتایی ئایەتەکە لە سوورەتی: (ق:٦).

پاشان:

(أُنْظُرْ إلى وجهِ السَّماء! كيفَ ترى سكوتاً في سكونةٍ، حركةً في حكمـــةٍ، تلؤلــؤاً في حشمة، تبسُّماً في زينة، مع انتظام الخلقة، مع اتزان الصنعة، تَشَعْشُــعُ ســراجِها، تَهَلْــهُلُ مصباحِها، تلؤلُؤُ نجومِها، تُعلِنُ لأهل النُّهى: سلطنةً بلا انتهاء)!

ئەم بڕگە (عەرەبی‌یانە) جۆرە لێکدانەوەیەکی هەندێ لە واتاکـانی ئایەتەکەی سەرەوەن. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوەیە:

(أُنْظُرْ إلى وجهِ السَّماء! كيفَ ترى سكوتاً في سـكونةٍ) واتـە: ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە سـەرنجی مرۆڤ بۆ ڕووی جـوان و ڕازاوەی ئاسمـان ڕادەکێشێت، تـاکو بـەو سـەرنجدان و تێڕامانـە: بێدەنگیی نێوان ئارامی و هێمنیی ئاسمان ببینێت و، بزانێت تەنها بە فـەرمان و ژێربـار خستنی فەرمانڕەوایەکی خاوەن توانستی ڕەهایـە کـە وا ئاسمـان شـێوە و بـارودۆخێکی وەهـای لـەخۆ گـرتـووە، چـونکـە ئـەگەر ئەو توانستە ڕەهایـە نەبوایـە، جڵـەوی ئاسمـان بـەردەدرا و لـە جمـوجـوڵ و وەستانی‌دا سەربەست دەبوو، دیـارە لـە کـاتێکی وەهـادا سـەرجەمی ئـەو تـەن و قـەبارە خڕ و زەبەلاحـە پێـك ئاڵاوانـە بـە جموجـوڵ و بزووتنـە هەڕەمـەکی و سـامناکەکانیان هێنـدە دەنگـی بەرز و ترسـناکیان دەردەکـرد کــە گـوێی سـەرانسـەری بوونـەوەرانیان کـەڕ بکردایە و، هێندە پشێوی و ئاڵۆزیشیان دەنایەوە کە سەرجەمی بوونەوەران لـە تـاوا هـەپروون هەپروون ببوونایە. چونکـە ئاشـکرایە کـە ئەگـەر بیسـت سـەر "گـامێش" لـەناو کێڵگەیـەکدا هەڵبچن و بە بۆڕەبۆڕ دەنگی ناقۆلا دەربکەن، ئەوا هەراوهوریایەکی ئـەوتۆ بـەرپا دەکـەن کـە پشـێوی و کـاولی لــەو کێڵگەیـەدا دەنێنـەوە! ئـاخۆ گـەر ئەسـتێرەکان بـەرباد بوونایــە چ کارەساتێکیان بنایەتەوە؟! لـە کاتێکدا کە ئەو قەبارە ئاسمانی‌یانە هی وایـان تێدایـە هـەزار جـار

له گۆی زه‌ویمان مه‌زنتره و حه‌فتا جاریش له تۆپی تۆپخانه جه‌نگی‌یه‌كانیش تیژڕه‌وتره، وه‌ك له زانستی "گه‌ردوون‌ناسی"دا چه‌سپاوه!

كه‌واته له‌م نموونه‌یه‌وه تێبگه كه ئه‌و هێمنی و ئارامی‌یه‌ی بالَی به‌سه‌ر ئاسماندا كێشاوه و سه‌رجه‌می ئه‌و قه‌بارانه‌ی گرتووه‌ته‌وه، به ڕوونی: مه‌ودای فراوانیی توانستی خواوه‌ندی خاوه‌ن كه‌مالَ و، ڕاده‌ی زالَ بوون و ده‌سته‌لاَتداریی كردگارمان له ملكه‌چ كردنی ئه‌وانه‌دا بۆ ئه‌و توانسته و، ئه‌ندازه‌ی گوێڕایه‌لَیی ئه‌ستێره‌كانیش بۆ فه‌رمانه‌كانی خوای گه‌وره، بۆ ده‌رده‌خات!

(حركةً في حكمةٍ) واته: ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه، پاش سه‌رنج ڕاكێشان بۆ لای ئه‌مه‌ی كه باس كرا، داوای ئه‌وه‌شمان لێ ده‌كات كه سه‌یری جموجوولَی به دانست نه‌خشاوی شتانی ڕووی ئاسمان بكه‌ین. چونكه ئه‌و بزووتن و جموجوولاَنه‌ی ئه‌وان یه‌كجار گه‌وره‌ن و له ناوه‌ندی دانستێكی هێنده ورد و فراواندان كه ژیریی تێدا سه‌رسام ده‌بێت و مرۆڤ به سه‌رسووڕمان و ڕێزه‌وه به‌رامبه‌ری ڕاده‌وه‌ستێت. ئه‌وه‌تا هه‌روه‌ك سنعه‌تكاری كارامه به‌پێی حیكمه‌تێكی دیاری‌كراو چه‌رخ و جه‌ڕ و پێچه‌كانی كارگه‌كه‌ی ده‌خاته گه‌ڕ و، به‌م ئه‌ندازه زانیاری‌یه و له نێوان گه‌وره‌یی و ڕێكوپێكیی كارگه‌كه‌دا كارامه‌یی و وردیی سنعه‌تی خۆی پیشان ده‌دات.. كردگاری مه‌زنی خاوه‌ن توانستی ڕه‌هایش (ولله المثل الأعلـــى) به هه‌مان جۆره، چونكه خۆر و هه‌ساره گه‌ڕۆكه‌كانی له شێوه‌ی كارگه‌یه‌كی مه‌زندا به‌دی هێناوه و ئه‌و ته‌ن و قه‌باره خڕ و تۆپ ئاسا و گه‌ورانه به وێنه‌ی به‌ردی بچووكی قۆچه‌قانێ هه‌لَده‌دات و وه‌ك چه‌رخه‌كانی كارگه‌یه‌كی ئاسایی و ساكار هه‌لَیان ده‌سووڕێنێت و، له‌م شێوه و بارودۆخه‌دا ده‌یانخاته پێش‌چاوی مرۆڤ، تاكو به ڕێژه و ئه‌ندازه‌ی ئه‌و گه‌وره‌یی‌یه، له سه‌ربه‌ستی و ڕه‌هایی توانستی خواوه‌ند و فراوانیی دانستی ئه‌و تێبگات!

(تلؤلؤاً في حشمة، تبسُّماً في زينـــة) واته: هه‌ر له ڕووی ئاسماندا هێنده دره‌خشانیی ڕه‌نگین و، ڕووگه‌شیی به‌سام و شكۆ و، خه‌نده‌ی جوان و ڕازاوه‌ی ئه‌وتۆ ده‌بینین كه گه‌وره‌یی ده‌سته‌لاَتی كردگاری مه‌زن و مه‌ودای وردیی له سنعه‌ته جوانه‌كانی‌دا ده‌رده‌خه‌ن. چونكه هه‌روه‌ك داگیرساندنی چراكان و ڕووناك كردنه‌وه‌ی ده‌وروبه‌ر و ده‌ربڕینی شادمانی و خۆشحالَی له ڕۆژی چوونه‌سه‌ر ته‌ختی پادشادا، بۆ مه‌به‌ستی ده‌رخستنی پله‌ی كه‌مالَی پادشایه له بواری پێشكه‌وتنی شارستانێتی‌دا.. به هه‌مان جۆر، ئاسمانه مه‌زنه‌كانیش، له ڕێی ئه‌ستێره به‌سام و شكۆكانیه‌وه، كه‌مالَی ده‌سته‌لاَتی كردگاری مه‌زن و جوانیی سنعه‌ته ناوازه‌كه‌ی له پێش‌چاوی مرۆڤی سه‌رنجده‌ری خاوه‌ن هه‌ست و شعووردا ده‌رده‌خه‌ن!

(مع انتظام الخلقة، مـــع اتـــزان الصنعـــة) هـەروەها ئەم دەستەواژەیە دەڵێـت: سـەیری ڕێکوپێکیی بەدیـهاتووانی ڕووی ئاسمان بکـە و تێبگـە کـە چۆن ئـەو بەدیهاتووانـە بـە چـەند تەرازوویـەکی ورد کێشـراون و دەستنیشـان کـراون. ئنجـا لەمەشـەوە بزانـە کـە توانسـتی کردگاری ئەم بەدیهاتووانە چەندە فراوانە و دانستەکەشی چەندە هەمەلایەنە و گشتی‌یە!

بەڵێ، بەڕێوەبردنی چەند ماددەیەکی بچووك یان چەند تەن و زیندەوەرێك، هـەروەها هەڵسووڕاندنیان و ژێربارخستنیان و دانەبەری هەموویان بەرەو ڕێگایەکی دیاریکراو کە بـە تەرازوویـەکی تایبـەتی دەستنیشـان کرابێـت.. ئـەم کـارە، مـەودای توانسـت و دانسـتی هەڵسووڕێنەریان دەردەخات و، ڕادەی گوێڕایەڵی و ملکەچیی ئەو مادده و زیندەوەرانـە ئاشکرا دەکات..

دیارە کاروباری ئاسمانـە یـەکجار بـەرین و فراوانـەکانیش بـە هـەمان جـۆرن. چونکـە ئەو ئاسمانانـە، بـە گەورەیی‌یـە سەرسـووڕهێنەکەیان و، ئەسـتێرە مەزنـە لەژمارەبـەدەرەکانیان و، بزووتنە ڕێکوپێکەکانی ئەستێرەکانیان، کە بێ ئـەوەی بـە ئـەندازەی سـەری پەنجەیەکیش لـە سنووری خۆیان لابدەن یاخود بۆ ماوەی چاوتروووکاندنێك لێی دوا بکەون یان بە قـەدەر یـەك لەسەر دەی خولەکێکیش لە کار و ئەرکی سەرشانیان سستی بنوێنن.. هەموو ئەم کارانە، بۆ گشت خاوەن بینایی و هەست و شعوورێکی دەردەخەن کـە: بەدیهێنـەر و کردگـاری مـەزنی ئاسمانـەکان و ئەسـتێرەکان، لـە ڕێـی ئـەنجامدانی ئـەم کارانـە و بـە تەرازوویـەکی تایبـەتی، پەروەردگاریتیی خۆی دەردەخات.

(تَشَعْشُعُ سراجِها، تَهَلْهُلُ مصباحِها، تلؤلُؤُ نجومِها، تُعلِنُ لأهل النُّـــهى: ســلطنةً بـــلا انتهاء)!

واتە: ڕامکردن و ژێربار خستنی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان، کە لـە زۆر ئایـەتی چەشنی ئەم ئایەتەی سەرەتا و ئەوەی سوورەتی "النبأ" و شوێنەکانی تـردا بـاس کـراوە، دەری دەخـات کە:

هـەڵواسـینی چرایەکی وەك "خـۆر" بـە بنمیچی ڕازاوەی ئاسمـاندا و بـڵاو کردنـەوەی گـەرمـی و ڕووناکی لـە ڕێی ئەو چرایە و، پێشچاو خستنی ئەو ڕووناکی‌یە لـە شـێوەی "مەرەکەب"دا بۆ نووسینی نووسراوە صەمەدانی‌یەکان بە خەتی "شەو و ڕۆژ" لەسەر لاپەڕەی "هاوین و زستان"دا!

هـــەروەها دانـانی "مـانگ" بـە وێنـەی میلـی کاتـژمێرێکی مـــەزن و ئـامـێری پێوانـەی کاتـەکان و، هەڵواسینی بە شوێنێکی بەرزدا بە چەشنی ئەو سەعاتانەی کە لەسەر بورجەکان

جێگیر ده‌كرێـن، ئه‌مـه‌ش به‌وه‌ی كـه "مـانگ" لـه چه‌ند مه‌نزڵگـه و هیلالێكی جۆراوجۆردا ده‌رده‌كه‌وێت، ته‌نانه‌ت ده‌ڵێـی هـه‌موو شـه‌وێك خـوای گـه‌وره هیلالێكـی تـری نوێـی غـه‌یری ئـه‌وه‌ی پێشـوو لـه ڕووی ئاسمـاندا داده‌نێـت، دوایـی هـه‌ر ئـه‌و هیلالانـه كـۆ ده‌كاتـه‌وه و بـه حسابێكی كامڵ و ورد به مه‌نزڵگاكانی خۆیاندا ده‌یانهێنێته‌وه!!

پاشـان جوانكـردن و ڕازاندنـه‌وه‌ی ڕووی ئاسمـان بـه "ئه‌سـتێره" ورشـه‌به‌خش و ده‌م بـه خه‌نده‌كانی گومه‌زی ئاسمان..

بێ هیچ گومانێك، ئه‌م كارانه هه‌ندێكن له نیشانه‌كانی "په‌روه‌ردگاریتی"یه‌كی ئـه‌وتۆ كـه مه‌زنایه‌تی‌یه‌كه‌ی سنووری نی‌یه و.. لـه هـه‌مان كاتیشـدا ئاماژه‌ن بـۆ "خوایـه‌تی"یـه‌كی هێنـده مه‌زن كه كۆتایی بۆ كه‌ماڵی نی‌یه.

دیاره هه‌موو ئه‌مانه‌ش كه‌سانی ژیر و خاوه‌ن بـیر بـه‌ره‌و ئیمـان و تـه‌وحید بـانگ و ڕێنمـایی ده‌كه‌ن.

* * *

سه‌یری لاپه‌ڕه‌ی ڕه‌نگینی په‌ڕاوی گه‌ردوون بكه!
ببینه كه خامه‌ی زێڕینی "توانست" چ نه‌خشێكی ناوازه‌ی كێشاوه!
ته‌نانه‌ت یه‌ك خاڵی ته‌ماوی و ڕه‌ش بۆ خاوه‌ن هه‌ستان نه‌ماوه‌ته‌وه..
ده‌ڵێی خواوه‌ند ئایه‌ته‌كانی خۆی به "نوور" نووسیوه‌ته‌وه!

ئنجا بزانه كه ئه‌م لاپه‌ڕه ڕه‌نگینه‌ی په‌ڕاوی گه‌ردوون چ موعجیزه‌یه‌كی مـه‌زنی دانسته و، چۆن مرۆڤیش بۆ ملكه‌چی و گوێڕایه‌ڵی، ده‌داته‌بەر!

هـه‌روه‌ها بیشـزانه كـه چ دیمه‌نگـه‌لێكی نـاوازه و بـه‌رزی سـه‌رنج بزوێـن لـه بۆشـایی ئـه‌م گه‌ردوونه‌دا پێكده‌هێنن!

هه‌روه‌ها گوێ بۆ وتاری به‌تام و شیرینی ئه‌ستێره‌كانیش ڕابگره..
با بزانیت كه: مۆری حیكمه‌تی نه‌خشاوی سه‌ر ڕوخساری "بوون" چیی بڕیار داوه!
ده‌بینیت: هه‌موویان پێكه‌وه له‌سه‌ر زمانی "حه‌ق" ده‌دوێن و به یه‌ك ده‌نگ ده‌ڵێن:
ئێمه به‌ڵگه‌ی ڕوونی دره‌خشانین له‌سه‌ر سام و هه‌یبه‌تی خواوه‌ندی به‌تواناى شكۆمه‌ند.
ئێمه شایه‌تی ڕاستین له‌سه‌ر "بوون" و "ته‌نیایی" و "توانست"ی به‌دیهێنه‌ری مه‌زن..

به چه‌شنی مه‌لائیكه‌ت، ته‌ماشای ئه‌و موعجیزاته خنجیله و ناسكۆڵانه ده‌كه‌ین كـه ڕووی زه‌وی‌یان ئارایشت داوه.

ئێمە هەزاران چاوی بینەرین کە لە ئاسمانەوە بەسەر ڕووی زەویدا دەڕوانین و، سەیری بەهەشت دەکەین.

هەزاران بەری ڕەنگینی درەختی بەدیهاتوانین کە دەستی دانستی خواوەندی شکۆمەند و خاوەنی جوانی، بە ئاسمان و لق و پەلەکانی ڕێی کاکێشاندا هەڵی واسیوین.

ئێمە بریتیین لە چەند مزگەوت و خانە و لانەیەکی گەڕۆك و بلند و، چەند گلۆپێکی ڕووناکیبەخش و، چەندەها کەشتی و فڕۆکەی گەورە بۆ ئاسمانەنشینان.

ئێمە موعجیزەی توانستی بەتوانایەکی خاوەن کەماڵ و.. کاری دەراسا(خارق)ی سنعەتی دانایەکی شکۆمەندین و..

دانایی نایاب و.. بەدیهاتووانی گەورە و گرنگ و.. چەندەها جیهانی ڕووناکیمان لە ئامێز گرتووە!

بەم جۆرە دەرکەوت کە: ئێمە بە هەزار و یەك زمان، هەزار و یەك بەڵگە بەرچاو دەخەین و دەیاندەین بە گوێی کەسانێکدا کە مرۆڤی ڕاستەقینەن.

دەك چاوی بابای مولحید کوێر بێت، کە ڕووی ڕووناکی ئێمە نابینێت و، گوفتارە ڕوون و ڕەوانەکانمان نابیستێت!.. ئێمە چەند بەڵگەیەکی ڕاست و ڕەواین کە "حەق" لەسەر زارمان دەردەچێت.

سککە و مۆری هەمووومان هەر یەکێکە و.. تێکڕا تەسبیحات گوزار و بەندەی پەروەردگارمانین و لە ژێر فەرمانی ئەوداین.

ئێمە بەدەم جەزبەی خۆشەویستیی خوای گەورەوە یاد و زیکری ئەو دەکەین و، هاوبەشی بازنەی زیکری ڕێی کاکێشانین!

* * *

# هەڵوێستی دووهەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ ۞ اللهُ الصَّمَدُ﴾

(ئەم هەڵوێستە سێ مەبەستی تێدایە)

## مەبەستی یەکەم

**نوێنەری شیرك و گومڕایی، کە بە تیربارانی ئەستێرەیەك کەوتە خوارەوە، وازی لەو جۆرە داوا و لاف لێدانە هێنا. چونکە نەیتوانی لە هیچ شوێنێکی گەردیلەکان تا دەگاتە گەلەستێرەکان هێندەی تۆزقاڵێك "شیرك" بدۆزێتەوە. بەڵام بە وێنەی شەیتان هاتەوە و ویستی لە نێوان سێ پرسیاری گرنگدا هەندێ گومان لە بابەتی "تاکی" و "تەنیایی"یەوە بهاوێتە دڵی یەکتاپەرستان و لەم ڕێیەوە گرفتاری دوودڵییان بکات لە تەوحیدەکەیاندا.**

❐ **پرسیاری یەکەم:**

بە زمانی بێ بڕوایی و ئیلحاد، وتی:

ئەی ئەهلی تەوحید! من کە بە ناوی ئەو شتانەی لە وەکیلییانەوە دەدوێم، هەموو بوونەوەرانم پشکنی و بە نێوانیاندا گەڕام، نەمتوانی شتێك بدۆزمەوە پشتی دەعواکەمی پێ بگرم و ڕاست بوونی ڕێبازەکەمی پێ بچەسپێنم. ئەی ئایا ئێوە چۆن بوونی خوایەکی تاك و تەنیا و خاوەن توانستی ڕەها دەچەسپێنن؟ چۆن پێتان وایە کە هەرگیز ناکرێت چەند دەستێکی دیکە تێکەڵی توانستی ئەو ببێت؟

**وەڵام:**

لە وتەی بیست و دووهەمدا بە جۆرێکی گومانبڕ چەسپێنرا کە: یەك بە یەکی سەرانسەری بوونەوەران هەر لە گەردیلەکانەوە تا هەسارەکان بەڵگەیەکی ڕووناکن لەسەر

"پێویستیی بوون"ی خوای گەورە کە "واجب الوجـود" و خـاوەن توانستی ڕەهایـە. هـەموو یەکێك لەو زنجیرانەی کە لەم جیهانەدان، بەڵگەیەکی گومانبڕ و تەواوەتین لەسەر "یەکتایی" خوای گەورە. قورئانی پیرۆز بە چەندین بەڵگەی بێسنوور ئەمەی چەسپاندووە. ئەوەندە هەیە قورئـان زیـاتر ئـەو بەڵگانـە دەخاتـە پێشچـاو کـە لـە بـەرچاوی زۆرینـە(عـەوام)ی خـەڵکیدا ئاشکرا بن. بۆ نموونە لە ئایەتی پیرۆزی:

﴿ولَئِنْ سأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّموات والأَرضَ لَيَقولُنَّ اللهُ﴾ (الزمر:٣٨).

هەروەها ئایەتی:

﴿وَمِنْ آياتِهِ خَلْقُ السَّموات والأَرضِ واختِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ وأَلْوانِكُمْ﴾ (الروم:٢٢).

هەروەها لـە ئایەتە زۆرەکانی تری هاوچەشنیاندا، قورئانی پیرۆز ئاسمانەکان و زەوی، وەك بەڵگەیەکی لەوپەڕی ڕوونی و ئاشکراییدا، پێشچاو دەخات لەسەر یەکتایی خـوای گـەورە. کەواتە هەموو کەسێکی خـاوەن هەسـت و شـعوور ناچـارە تەسـدیقی بەدیهێنەرەکـەی بکـات لەوەدا کە هەر تەنها ئەوە ئاسمانەکان و زەویی بەدی هێنـاوە، وەك قورئـانی پیـرۆز دەفـەرموێ: ﴿لَيَقولُنَّ اللهُ﴾.

لە هەڵوێستی یەکەمدا، مۆر و تەمغەی تـەوحیدمان بەسـەر هـەموو بوونەوەرانـەوە ڕوون کردەوە، هەر لە یەك دانە گەردیلەوە تا دەگاتە هەسارە گەڕۆکەکان و گشت ئاسمانەکان.

قورئانی پیرۆز، بە وێنەی ئەم ئایەتانـە، هەمیشـە "شـيرك" دەردەکـات و دووری دەخاتـەوە، هەر لە ئەستێرە و ئاسمانەکانەوە تا دەگاتە گەردیلەکان. ئەوەتا هەمیشە قورئان ئامـاژە دەکـات بۆ ئەوەی کە:

ئەو خاوەن توانستە ڕەهایەی کە ئاسمانەکان و زەویی بـە ڕێسـایەکی نـاوازە بـەدی هێنـاوە، دەبێ بـە ڕوونـی و بەڵگەنەویسـتی "کۆمەڵــەی خــۆر"یــش - کــە هــەندێکن لــە بازنــەکانی بەدیهاتووانی - لەناو دەستی توانستی ئەودا بێت..

هـەروەها مـادەم ئـەو خـاوەن توانسـتە ڕەهایـە خۆر و گشـت هەسـارە گەڕۆکـەکانیش لـە دەستی خۆیدا ڕادەگرێت و دەیانهۆنێتەوە و هەڵیاندەسـووڕێنێت و ملکـەچ و گوێڕایـەڵیان دەکات، ئەوا دەبـێ "گـۆی زەوی"ش کـە بەشـێکە لـەو کۆمەڵەیـە و وابەستەی خـۆرە، لـەناو توانست و لە ژێر بەڕێوەبردن و کارسازیی ئەودا بێت..

هەروەها مادەم گۆی زەوی لە ناوەندی دەستی کارسازی و بەڕێوەبردنی ئەودایە، ئـەوا بـە ئاشکرا دەبێ ئەو "بەدیهاتووانە"ش کە لە سەر ڕووی زەوی بەدی دەهێنرێن و دەنووسرێن و بە

بـه‌روبووم و ئه‌نجامـه‌كانی گـۆی زه‌وی داده‌نرێـن، ئـه‌وانیش لـه‌ناو ده‌سـتی توانسـتی په‌روه‌ردگارێتی‌یه‌كه‌ی ئه‌ودا بن..

هه‌روه‌ها مادەم سه‌رجه‌می ئـه‌و به‌دیهاتووه زۆر و پـه‌رش و بلاوانـه‌ی كـه ڕووی زه‌وی‌یـان جوان كـردووه و ئارایشتیان داوه و هه‌میشـه زه‌وی‌یـان لـێ پڕ ده‌كرێـت و پاشـان خـالیش ده‌كرێتـه‌وه لێیـان، لـه‌ناو ده‌سـتی توانسـت و زانسـتی خـوای گـه‌وره‌دان و بـه تـه‌رازووی دادگه‌ری و دانایی ئه‌و ده‌كێشـرێن و ڕێـك ده‌خرێـن و، هـه‌موو جۆره به‌دیـهاتووه‌كانی زه‌وی له‌ناو ده‌ستی قودره‌تی خـوادان.. ئـه‌وا ده‌بێ "تـاك تـاك" و "دانـه دانـه" ورد و ڕێكوپێكـه‌كانی جۆره‌كـانی ئـه‌و به‌دیهاتووانـه‌ش، كـه هـه‌ر یه‌كـه‌یان وه‌ك نموونه‌یـه‌كی پوخـت و بچووكـی "جیهان" و پێڕستێكی هه‌موو جۆره‌كانی بوونه‌وه‌رانن، به ئاشكرا و به‌ڵگه‌نه‌ویستی، له ده‌ستی په‌روه‌ردگارێتیی خوای گه‌وره‌دا بن و، به‌دیهێنان و به‌ڕێوه‌بردن و پـه‌روه‌رده‌كردنیان لـه لایـه‌ن ئه‌و خواوه‌نده‌وه بێت..

هـه‌روه‌ها مـادەم هـه‌موو "زینـده‌وه‌ر"ێـك لـه ده‌سـتی كارسـازی و پـه‌روه‌رده‌ی خـوای گه‌وره‌دایه، ئـه‌وا ده‌بێ هـه‌موو "خانـه" و "خرۆك" و "ئـه‌ندام" و "ده‌ماره‌كـان" كـه جه‌سته‌ی زینده‌وه‌ران پێكده‌هێنن، به ئاشكرا و به‌داهه‌ت، له‌ناو ده‌ستی زانست و توانستی ئه‌ودا بن.

هـه‌روه‌ها مـادەم هـه‌موو خانـه و خرۆكێكـی خوێـن ملكـه‌چی فه‌رمانـه‌كانی خـوا بـن و بـه كارسازیی خوای گه‌وره كاره‌كانیان ڕێك بخرێت و به‌پێی یاسای ئه‌و بجووڵێنه‌وه، ئـه‌وا ده‌بێ هـه‌موو "مـادده سـه‌ره‌كی"یـه‌كانیان و گشـت "گه‌ردیلـه"كـانی چنینـی نـه‌خش و نیگـاری به‌دیهاتنیان، به ئاشكرا و به‌ڵگه‌نه‌ویستی، له‌ناو ده‌سـتی توانسـت و لـه نێـوان بازنـه‌ی زانستی ئه‌ودا بـن و، ده‌بـێ بـه فـه‌رمان و ڕوخسـه‌ت و هـێز و توانـای خـوای گـه‌وره بجووڵێـن و كاره‌كانیان به ڕێكوپێكی و به ته‌واوترین شێوه جێبه‌جێ بكه‌ن..

هه‌روه‌ها مادەم كارئه‌نجامدان و بزووتنـی هـه‌موو گه‌ردیله‌یـه‌ك بـه‌پێی یاسـا و ڕوخسـه‌ت و فه‌رمانی خوایـه، ئـه‌وا بـه ئاشـكرا و به‌ڵگه‌نه‌ویسـتی ده‌بێ "ده‌ستنیشـان كـردن"ی ڕوخسـار و ده‌موچاوه‌كان و "دانـانی نیشـانه جوداكـه‌ره‌وه‌كان" چ لـه سه‌روسیما و چ لـه زمـانی هـه‌موو یه‌كێكدا، ته‌نها به زانست و دانستی ئه‌و بێت.

سه‌رنج له‌م ئایه‌ته پیرۆزه بده كه سه‌ره‌تا و كۆتایی ئه‌م زنجیره ناوبراوه ده‌رده‌خات:

**﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّموات والأرضِ واختِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ وأَلْوانِكُمْ إِنَّ في ذلـكَ لآيـاتٍ للعالِمينَ﴾** (الروم:٢٢).

دەسا ئەی نوێنەری ئەهلی شیرك! بزانە! ئەو بەڵگانەی کە ڕێبازی "تەوحید" دەچەسپێنن و بەڵگەن لەسەر خواوەندی خاوەن توانستی ڕەها، بە ئەندازەی هێزی زنجیرەی بوونەوەران زۆر و زەبەندە و بەهێزن. چونکە مادەم بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی بەڵگەیە لەسەر کردگارێکی بەتوانا و لەسەر توانستی ڕەها و کەماڵی توانستی ئەو، ئەوا دەبێ هەرگیزاوهەرگیز لە هیچ لایەکدا پێویستی بە هیچ هاوبەشێك نەبێت. جا مادەم وەك بە چاوی خۆت دەبینیت پێویست بە هاوبەش ناکات، ئیتر بۆچی دوای ئەم ڕێبازە تاریکە کەوتوویت؟ یان چی هانت دەدات بڕۆیتە ناویەوە؟

جا مادەم پێوست بە هاوبەش ناکات و سەرجەمی بوونەوەرانیش هەرگیز پێویستیان بە هاوبەش نی‌یە، ئەوا بێ هیچ گومانێك بوونی هاوبەش لە خوایەتی و پەروەردگارێتی و بەدیهێنانیشیدا بۆ شتان کارێکی مەحاڵە، چونکە وەك چەسپاندمان ئەو توانستەی کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی هەیەتی، بێ کۆتایی و نەبڕاوەیە و لەوپەڕی کەماڵدایە.

خۆ ئەگەر هەر هاوبەشێك ببوایە ئەوا دەبوو توانستێکی تری بڕاوە و خاوەن کۆتایی بەسەر ئەو توانستە بێ کۆتایی‌یەدا، کە لەوپەڕی کەماڵدایە، سەربکەوتایە و هەندێ جێگای لە بێ کۆتایی‌یەکەی ئەو بگرتایە و نەیهێشتایە بێ کۆتایی بێت و، بیخستایەتە دۆخی کۆڵەواری و دەستەوسانی‌یەکی مەعنەوی و، ئەو توانستە بێ‌سنوورەشی لە سنووڕێکدا ڕابگرتایە! بەو واتایەی: شتێکی "کۆتایی پێهاتوو" کۆتایی بە شتێکی "بێ کۆتایی" بهێنێت کە لە کەماڵی نەبڕاوەیی‌دایە و بیکات بە شتێکی کۆتایی پێ‌هاتوو!! خۆ ئەمەش لە هەموو مەحاڵێك مەحاڵتر و بەتاڵتر و دوورترە لە ژیری و مەنتیقەوە.

پاشان خۆ هاوبەشەکان هەرگیز پێویست نین و لە زاتی خۆیاندا بوونیان مەحاڵە. کەواتە دەعوای بوونی هاوبەش سەرتاپا "دەعوایەکی تەحەککومی"یە، چونکە لەبەر ئەوەی بە مەنتیق و بیر و ژیری هیچ هۆکارێك نی‌یە بۆ ئیددیعا کردنی ئەم چەشنە دەعوایە، ئەوا بە قسەیەکی پڕوپووچی بێ واتا و ناوەرۆك دادەنرێت. لە زانستی "ئوصوول"دا بەم چەشنە دەعوایە دەوترێت: "تەحەککومی". واتە دەعوایەکی بێ واتا و ناوەرۆکە.

یەکێك لە یاسا بڕیاردراوەکانی زانستی کەلام و زانستی ئوصوول بریتی‌یە لەم دەستوورەی کە:

(لا عبرةَ للإحتمال غير الناشيء عن دليل، و لا ينافي الإمكانُ الّذاتي اليقينَ العلمي).

نموونەی ئەمە وەك ئەوەی کە: مومکینە و دەگونجێ دەریاچەی "بارلا" ببێت بە "دۆشاو" یان بگۆڕێت بە "ڕۆن"! ئەمە تەنها گریمانێکە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم گریمانە لە هیچ نیشانەیەکەوە پەیدا نەبووە، ئەوا کار ناکاتە سەر دڵنیایی‌یەکەمان و هیچ گومان و

دوودڵی‌یه‌ك ناهاوێته ناو ئه‌و یه‌قینه زانستی‌یه‌ی كه‌ هه‌مانه‌ سه‌باره‌ت به‌وه‌ی ئه‌و ده‌ریاچه‌یه‌ "ئاو"ه‌ و شتی تر نی‌یه‌.

به‌ وێنه‌ی ئه‌م نموونه‌یه‌، ئێمه‌ له‌ هه‌موو گۆشه‌ و جێگایه‌كی بوونه‌وه‌راندا، هه‌ر له‌ گه‌ردیله‌كانه‌وه‌ تا ده‌گاته‌ هه‌ساره‌كان - وه‌ك ئه‌وه‌ی له‌ هه‌ڵوێستی یه‌كه‌مدا بینیمان - ئنجا هه‌ر له‌ به‌دیهێنانی ئاسمانه‌كان و زه‌وی‌یه‌وه‌ تا جۆراوجۆریی ڕه‌نگ و زمانه‌كانی مرۆڤ - وه‌ك ئه‌وه‌ی له‌م هه‌ڵوێستی دووهه‌مه‌دا ده‌بینرێت - پرسیارمان ئاراسته‌ی سه‌رجه‌می بوونه‌وه‌ران كرد. وه‌ڵامه‌كه‌شیان به‌ زمانی حاڵ شایه‌تی‌دانی ڕاست بوو له‌سه‌ر "وه‌حدانییه‌ت" و به‌ڵگه‌ی گومانبڕ بوو له‌سه‌ر "مۆری ته‌وحید" كه‌ به‌سه‌ر هه‌موو شتێكه‌وه‌ نه‌خشێنراوه‌، وه‌ك به‌ چاوی خۆت بینیت.

له‌به‌ر ئه‌وه‌، له‌ ناوه‌ندی سه‌رانسه‌ری بوونه‌وه‌رانی گه‌ردووندا ته‌نانه‌ت هیچ "نیشانه‌"یه‌كیش نی‌یه‌ كه‌ بكرێت گریمانی شیركی له‌سه‌ر بنیات بنرێت. به‌و واتایه‌ی كه‌ ده‌عوای "شیرك" ته‌نها ده‌عوایه‌كی ته‌حه‌ككومی و، قسه‌یه‌كی بێ واتا و نابه‌جێ‌یه‌ و، له‌ "ڕاستی" به‌تاڵه‌. له‌به‌ر ئه‌وه‌، هه‌ركه‌سێك - دوای ئه‌مه‌ - هه‌ر هێشتا ئیددیعای شیرك بكات، مانای وایه‌ له‌ ناوه‌ندی نه‌زانی‌یه‌كی سه‌رتاسه‌ری و گه‌وجی و گه‌حۆیی‌یه‌كی له‌ڕاده‌به‌ده‌ردا خۆی ده‌گه‌وزێنێت!

له‌ به‌رده‌م ئه‌م به‌ڵگه‌ به‌هێز و ده‌مكوت‌كه‌رانه‌دا، "نوێنه‌ری گومڕایی" ده‌حه‌په‌سێت و هیچ شتێكی پێ ناوترێت ئه‌وه‌ نه‌بێ كه‌ ده‌ڵێت:

- ته‌رتیب‌بوونی شتانی ناو بوونه‌وه‌ران له‌سه‌ر یه‌كتر، نیشانه‌یه‌كه‌ له‌سه‌ر شیرك. چونكه‌ هه‌موو شتێك په‌یوه‌ستی هۆكارێكه‌. به‌و واتایه‌ی كه‌: "هۆكاره‌كان" كاریگه‌ریی ڕاسته‌قینه‌یان هه‌یه‌. خۆ مادەم كاریگه‌ریی ڕاسته‌قینه‌یان هه‌یه‌، ئه‌وا ده‌كرێت به‌ هاوبه‌ش دابنرێن!

**وه‌ڵام:**

به‌ هۆكراوه‌كان(المسَــبَّبات) ته‌نها به‌پێی داخوازیی ویست و دانستی خوای گه‌وره‌ په‌یوه‌ستی هۆكاره‌كان(الأسباب) كراون. ئنجا له‌به‌ر ئه‌وه‌ش كه‌ پێویسته‌ گه‌لێ ناوی جوانی خوای گه‌وره‌ ده‌ربخرێن، ئه‌وا هه‌موو شتێك به‌ هۆكارێكه‌وه‌ په‌یوه‌ست ده‌كرێت. له‌ زۆر جێگا و گه‌لێ وته‌دا به‌ جۆرێكی گومانبڕ چه‌سپاندمان كه‌ "هۆكاره‌كان" هه‌رگیزاو هه‌رگیز له‌ بواری دروستكردن و به‌دیهێناندا كاریگه‌ریی ڕاسته‌قینه‌یان نی‌یه‌.

لێرەشدا دەڵێین:

بێ گومان "مرۆڤ" بەرێزترینی هۆکارەکانە و، ویست و ئیختیاریشی لە هەموویان فراوانترە و، هەڵسوکەوتیشی لە کاروبارەکاندا گشتیتر و هەمەلایەنترە. کەچی لە ئاشکراترینی کردارە ئیختیاریيەکانیدا، وەك: خواردن و، قسە و، بیرکردنەوە – کە هەریەکەیان زنجیرەیەکی سەرسوورهێنی لەوپەڕی ڕێکوپێکی و حیکمەتدان – یەك لە سەدی ئەنجامدانی زنجیرەکە نەبێت چ بەشێکی تری لە ئەستۆدا نیيە!

بۆ نموونە: زنجیرەی ئەو کردارانەی کە بە خواردن دەست پێدەکات و خۆراکی تێدا بە خانەکان دەدرێت، تا دەگاتە ئەو شێوەیەی کە وەك بەروبووم لە جەستەی مرۆڤدا دەردەکەون، مرۆڤ لە ناوەندی ئەم زنجیرە دوور و درێژەدا، تەنها جوینی خواردنەکەی لە ئەستۆدایە! هەروەها لە زنجیرەی قسەکردنیشدا، کاری ئەو تەنها لە بردنەژوورەوە و هێنانەدەرەوەی هەوادایە بۆ شوێنی دەرچوونی پیتەکان لەناو دەمدا! لە کاتێکدا کە هەموو وشەیەك لەناو دەمی ئەودا، هەرچەند بە وێنەی "تۆو"ێك وایە، بەڵام لە حوکمی "درەخت"دایە، چونکە ملیۆنەها دانە لە خودی ئەو وشەیە لەناو هەوادا بەرهەم دەهێنێت و دەڕواتە گوێی ملیۆنەها کەسی گوێبیستەوە! خۆ مەگەر دەستی ئەندێشەی مرۆڤ دەنا هیچ شتێکی تر ناگاتە ئەم درەخت و گوڵە گەنمە میسالیيە، ئیتر لە کوێ دەستی کورتی ئیختیاری مرۆڤی پێ دەگات؟!

لە کاتێکدا "مرۆڤ" کە بەرێزترینی بوونەوەرانە و لە هەموویان زیاتر خاوەن ئیختیارە، سەبارەت بە "بەدیهێنانی ڕاستەقینە" ئاوا دەستی بەسترابێت، دەبێ "بێ گیانەکان" و "ئاژەڵەکان" و "تۆخمەکان" و "سروشت" چۆن بن؟ یان چۆن بتوانن هەڵسوکەوتی ڕاستەقینە لەو بوارەدا ئەنجام بدەن؟!

کەواتە ئەو هۆکارانە تەنها بەرگ و پۆشاکی بەدیهاتووەکانی پەروەردگار و.. دەفری دیاریيەکانی خواوەندی میهرەبان و.. خزمەتگوزاری پێشکەش کردنی ئەو دیاريیانەن. خۆ بێ هیچ گومانێك ئەو قاپ و دەفرانەی کە دیاريیەکانی پادشایان تێدا پێشکەش دەکرێن و، ئەو قوماش و پارچە کوتاڵانەش کە لە دیاريیەکانیەوە دەپێچرێن و، ئەو سەربازەش کە دیاريیەکەی پادشای پێدا دەنێررێت، هەرگیزاوهەرگیز هاوبەشی پادشا نین. خۆ هەر کەس لەو گومانەدا بێت ئەوا دیارە وڕێنەیەکی لەڕادەبەدەری لە زار دەرچووە!

بەم جۆرە دەرکەوت کە:

هۆکارە ڕواڵەتيیەکان هیچ بەشێکیان لە "پەروەردگارێتی"ی خوادا نیيە و، جگە لە ڕاپەڕاندنی خزمەتگوزاریی "بەندایەتی" هیچی تریان لە ئەستۆ نەنراوە.

# مه‌به‌ستی دووهه‌م

دوای ئـه‌وه‌ی نوێنـه‌ری "ئـه‌هلی شـیرك" نـه‌یتوانی ڕێبـازی "شـیرك" لـه‌ هیـچ لایـه‌كدا بچه‌سـپێنێت و نـائومێدیی به‌ده‌سـت هێنـا، ویسـتی هـه‌ولی بلاوكردنـه‌وه‌ی گومـان و دوودڵی‌یه‌كانی بدات، تاكو له‌م ڕێیه‌وه ڕێبازی "ئه‌هلی ته‌وحید" بڕووخێنێت. له‌به‌ر ئه‌وه:

☐ **پرسیاری دووهه‌می كرد و وتی:**

ئه‌ی ئه‌هلی ته‌وحید!

ئێوه ده‌ڵێن:

**﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَد ۞ اللهُ الصَّمَدُ﴾.**

واتـه: بـه‌دیهێنـه‌ری جیهـان كه‌سـێكی تـاك و تـه‌نیا و صـه‌مـه‌ده و، به‌دیهێنـه‌ری هـه‌موو شـتێكه و، كلیل و جڵه‌وی گشت شتێكی له ده‌ستدایه و، به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا زاڵـه و، لـه یـه‌ك كـاتدا ده‌ستكاریی ئیـش و كـاری هـه‌موو شتێك ده‌كـات لـه هـه‌موو حاڵـه‌تێكیاندا، بێ ئه‌وه‌ی شتێك ڕێی شتێكی تری لێ بگرێت..

ئایا چۆن ڕاستی‌یه‌كی ئاوا سه‌رسووڕهێن ده‌سـه‌لمێنرێت؟ ئایـا ده‌كرێـت ته‌نـها یـه‌ك كه‌سـی دیاری كراو لـه چـه‌نده‌ها شـوێنی زۆروزه‌به‌نده‌ی بێ كۆتـایی‌دا و، بێ هیـچ چه‌شـنه قورسـی و گیروگرفتێك چه‌نده‌ها كاری نه‌بڕاوه‌ی بێ كۆتایی ئه‌نجام بدات؟

**وه‌لام:**

وه‌لامی ئه‌م پرسیاره به ڕوونكردنه‌وه‌ی نهێنیی "ئه‌حه‌دییه‌ت" و "صه‌مه‌دییـه‌ت" ده‌درێتـه‌وه، كـه له‌وپـه‌ڕی قووڵـی و بـه‌رزی و فراوانی‌دایـه، ته‌نانـه‌ت بیری مرۆڤیـش ناگاتـه ئـه‌وه‌ی لـه‌و نهێنی‌یه مه‌زنه تێ‌بگات، مه‌گه‌ر به چاویلكه و دووربینی "نموونه هێنانـه‌وه". جـا له‌بـه‌ر ئـه‌وه‌ی زاتی خوای گه‌وره و سـیفه‌ته مه‌زنه‌كانی هیـچ شتێك لـه وێنـه‌یان نی‌یـه، تـا نموونـه‌یان لـه‌سـه‌ر بهێنرێته‌وه، ئه‌وا به نموونه هێنانه‌وه بۆ كاروباره سه‌رتاپا دانایی‌یه‌كانی - بـه چـه‌ند نموونه‌یـه‌كی ماددی - ئاماژه بۆ ئه‌و نهێنی‌یه ده‌كه‌ین:

*نموونه‌ی یه‌كه‌م:*

وه‌ك له وته‌ی شازده‌هه‌مدا چه‌سپاندمان: ته‌نـها یـه‌ك كـه‌س لـه ڕێی ئاوێنه‌كانـه‌وه سیفه‌تی هه‌مه‌كێتی(كلیـة) به‌ده‌سـت ده‌هێنێـت. واتـه ئـه‌و كه‌سـه هه‌رچـه‌نده لـه ڕاسـتی‌دا شـتێكی "جوزئی"یه، كه‌چی له‌م ڕێیه‌وه له حوكمی "كوللی"یه‌كی ئه‌وتۆدا ده‌بێ كه خاوه‌نی گه‌لـێ ئیش و كاری زۆر بێت.

هەروەك شووشە و ئاو، هەروەها ئەو ماددانەش کە لەوان دەچن، دەبن بە ئاوێنەی شتانی جیسمانی(ماددی) و لەم ڕێیەوە شتە ماددی‌یەکە سیفەتی هەمەکێتی بەدەست دەهێنێت.. بە هەمان جۆر، هەوا و ئەثیر و هەندێ لە بوونەوەرانی جیهانی میسالیش لە حوکمی ئاوێنەدان و بە خێرایی بروسکە و ئەندێشە شێوەی چەند هۆکارێکی گەشتوگوزار دەگرنە خۆیان. بە چەشنێ کە شتە نوورانی و ڕۆحی‌یەکان، بە خێرایی ئەندێشە، بە ناو ئەو ئاوێنە خاوێن و مەنزڵگا نیان و ناسکانەدا دێن و دەڕۆن و، لە یەك کاتدا دەڕۆنە ناو هەزاران جێگای جیا جیا. جا لەبەر ئەوەی ئەو شتانە خۆیان "نوورانی"ن و وێنەکانیشیان لە ئاوێنەکاندا خودی خۆیانن و سیفەتەکانی ئەوانیان هەیە - بە پێچەوانەی شتانی ماددی - ئەوا بە چەشنێك بەسەر ئەو جێگایانەدا زاڵ دەبن کە دەڵێی خودی خۆیانن لەوێدا ئامادەن! کەچی وێنەی شتانی ماددی و چڕ لەناو ئاوێنەکانیاندا خودی ئەو شتانە نین و سیفەتەکانی ئەوانیشیان تێدا نی‌یە، چونکە وێنەیەکی مردووە!

بۆ نموونە: "خۆر" هەرچەند "جوزئی"یەکی دیاریکراوە، کەچی لە ڕێی ماددە بریسکەدارەکانەوە دەچێتە حوکمی "کوللی"یەوە، چونکە وێنە و نموونەکەی خۆی دەدات بە هەموو ماددەیەکی بریسکەدار و گشت دڵۆپە ئاوێك و هەموو پارچە شووشەیەکی سەر ڕووی زەوی، دیارە هەر یەکە و بەپێی توانا و لێهاتنی خۆی. ئیتر لەم ڕێیەوە: گەرمی و، ڕووناکی و، حەوت ڕەنگەکان و، جۆرە وێنەیەکی زاتە میسالی‌یەکەی "خۆر" لە هەموو تەنێکی بریسکاوەدا، ئامادە دەبێت.

گەر وا دابنرێت "خۆر" خاوەنی زانین و هەست و شعوور بێت، ئەوا هەموو یەکێك لەو ئاوێنانە بە وێنەی مەنزڵ و تەخت و کورسیی ئەو دەبێت و، هەر بە "زاتی خۆی" لە ڕێی ئاوێنەکانەوە، تەنانەت بەهۆی بیلبیلەی چاوی ئەو خاوەن هەستەوە، بە وێنەی تەلەفۆن کردن، پەیوەندیی لەگەڵ ئەو خاوەن هەستەدا دەبەست و، هیچ شتێك نەدەبووە تەگەرە لە ڕێی شتێکی تردا و هیچ پەیوەندی‌یەکی تەلەفۆنییش ڕێگای لە پەیوەندی‌یەکی تر نەدەگرت، ئەوەتا "خۆر" هەروەك لە هەموو جێگایەکدا ئامادەیە، کەچی جێگا و شوێن ناتوانێت سنووری بۆ دابنێت!

لە کاتێکدا "خۆر" کە لە حوکمی ئاوێنەیەکی ماددی و جوزئی‌دایە و تەنها یەك ناوی لە نێوان هەزار و یەك ناوە جوانەکانی خوای گەورەی لە خۆدا دەرخستووە کە ناوی "النور"ە و، سەرەڕای ئەوەش کە خاوەنی جەستە و قەبارەشە، تا ئەم ڕادەیە خاوەنی کاری گشتی بێت و، لە چەندەها جێگای هەمەکی‌دا ئامادە بێت، ئایا خوای گەورەی شکۆمەند ناتوانێت بە تەنیایی زاتی نوورانێتیی خۆی لە یەك کاتدا چەندەها کاری لەژمارەبەدەری بێ کۆتایی ئەنجام بدات؟!

*نموونەی دووهەم:*

مادەم بوونەوەران لە حوکمی درەختدان، ئەوا دەگونجێ بۆ مەبەستی دەرخستنی راستییەکانی بوونەوەران، "درەخت" بە نموونە بهێنینەوە.

وا درەختی ئەم پەڵکە زەبەلاحەی بەردەم ژوورەکەمان، بە سیفەتی ئەوەی نموونەیەکی پوخت و بچووکی بوونەوەرانە، بە نموونە دەهێنینەوە و، بە هۆیەوە درەوشانەوەی "تەنیایی" خوای گەورە لە بوونەوەردا، بەم جۆرەی خوارەوە، روون دەکەینەوە:

ئەم درەختە – بە لای کەمەوە – دە هەزار بەر و، هەموو یەکێکیش لەو بەرانە – بە لای کەمەوە – سەدان تۆوی باڵداری هەیە. واتە هەموو یەکێك لەو دە هەزار بەر و ملیۆن تۆوە لە یەك کاتدا کاری بەدیهێنان و وردەکارییان تێدا ئەنجام دەدرێت. لە کاتێکدا کە "گرێی ژیان" لەناو تۆوە ئەسڵییەکەی ئەم درەختە و لە رەگ و قەدەکانیدایە و، شتێکی دەستنیشان کراوە و، لە درەوشانەوەی ویستی خواوەیە و، ناوکێکە لە "ئەمر"ی پەروەردگار. هەر بەم درەوشانەوە جوزئییەش مەرکەزییەتی یاساکانی دروستبوونی درەخت پێکدێت، کە لە سەرەتای هەموو پەل و لەناو گشت "بەر" و تەنیشتی هەموو "تۆو"ێکدان، بە چەشنێ کە ئەم یاسایانە هیچ بەشێکی درەختەکە بە ناتەواوی ناهێڵێتەوە و چ شتێك رێیان لێ ناگرێت.

پاشان ئەم تەنها درەوشانەوەیەی "ویست"ی خوایی و "ئەمر"ی پەروەردگاری، بە وێنەی: رووناکی و گەرمی و هەوا، بڵاو نابێتەوە. چونکە لەو ماوە دوورانەی نێوان ئەو شوێنانەی بۆیان دەڕوات و ئەو بەدیهاتووە جۆراوجۆرانەی بەدییاندەهێنێت، هیچ ئاسەوارێك بەجێ ناهێڵێت، تەنانەت هەر ئاسەواریشی دەرناکەوێت. چونکە ئەگەر ئەو درەوشانەوەیە بە بڵاوبوونەوە بوایە، شوێنەوارەکەی دەردەکەوت. بەڵکو بێ بڵاوبوونەوە و لەت بوون، لە تەنیشتی هەموو بەشێکی ئەو بەدیهاتووە، ئامادەیە و، ئەم کارە هەمەکییانەش دژ و پێچەوانەی "زاتییەت" و "تەنیایی"ی ئەو نین..

لەبەر ئەوە، دەتوانرێت بوترێت: ئەو درەوشانەوەیەی ویستی خوای گەورە و ئەو یاسا ئەمرییە و ئەو گرێی ژیانەی لە تەنیشتی هەموو جوزئێکی بەدیهاتووەکەدا ئامادەیە و هەرگیز بە جێگایەکەوە نەبەستراوە. تەنانەت دەڵێی ئەم درەختە بەسام و شکۆیە، بە ئەندازەی ژمارەی بەر و تۆوەکانی، چاو و گوێی تێدایە بۆ ئەو یاسا ئەمرییە، تەنانەت هەموو یەکێك لە بەشەکانی ئەم درەختە لە حوکمی مەڵبەندێکدایە بۆ هەست و شعوورەکانی ئەو یاسا ئەمرییە، بە رادەیەك کە ماوە دوورەکانی لێ نابن بە رێگر، بەڵکو بە وێنەی تەل و وایەرەکانی تەلەفۆن دەبن بەهۆی ئاسانکردن و نزیك خستنەوە! کەواتە کامەی زۆر دوورە لەگەڵ ئەوەدا کە زۆر نزیکە وەك یەك وان و یەکسانن.

مادەم ئێمە تەنها یەك درەوشانەوەی جوزئیی سیفەتی "ویست"ی خواوەندی تەنیای صەمەد بە چاوی خۆمان لە ملیۆنێك جێگادا دەبینین و، بێ ئەوەی پێویستی بە هۆکاریش بێت دەبێت بە مایەی ئەنجامدانی ملیۆنەها کار، ئەوا پێویستە بە ئەندازەی پلەی "شهوود" دڵنیایی و یەقینمان هەبێت بە توانستی زاتی مەزنی خوای گەورە لە دەستکاری کردنی "درەختی بەدیهاتووان" و هەڵسوکەوت کردن لە هەموو بەش و گەردیلەیەکیدا پێکەوە، تەنها بە یەك درەوشانەوەی توانست و ویستی خۆی.

هەروەك لە وتەی شازدەهەمدا چەسپاندوومانە و ڕوونمان کردووەتەوە، دەڵێین:

لە کاتێکدا بوونەوەرانێکی دەستەوسانی ژێربارخراوی وەك "خۆر" و چەند دروستکراوێکی نیمچە نوورانیی پابەندی ماددە وەك "شتانی ڕۆحانی"، بگونجێت بەهۆی نوورانێتییەوە ئەو بوونەوەرە جوزئییە پابەند و بەستراوەیە، بەهۆی ویستێکی هەندەکییەوە، لە یەك کاتدا گەلێ کار ئەنجام بدات و حوکمێکی هەمەکی و ڕەها بەدەست بهێنێت.. دەبێ ئەو کەسە چۆن بێت کە خاوێنە لە ماددییەت و لەوەش کە بە هیچ سنوورێك دەستنیشان بکرێت و هەرگیز تاریکایی: "چری و پری" - کە سیفەتی ماددەیە - توخنی ناکەوێت.. تەنانەت ئەم هەموو ڕووناکی و شتە نوورانییانە تەنها چەند سێبەرێکی چری ڕووناکییەکانی ناوە جوانەکانی ئەون.. تەنانەت سەرجەمی بوونەوەران و ژیان و جیهانی ڕۆح و جیهانی میسالیش تەنها چەند ئاوێنەیەکی ڕوونی دەرخستنی جوانیی ئەو خواوەندە خاوێن و مەزنەن کە سیفەتەکانی دەورەی هەموو شتێکیان داوە و کاروبارەکانیشی هەموو شتێکیان گرتووەتەوە..

ئایا دەبێت چ شتێك هەبێت بتوانێت ڕووی خۆی لە ڕووتێکردنی "تەنیایی" ئەو بشارێتەوە، کە لە نێوان درەوشانەوەی سیفەتە گشتگیر و کاروبارەکانیدا دەدرەوشێتەوە، ئەوانەی کە بە ویستی هەمەکی و توانستی ڕەها و زانیاریی بە هەمووشت ئاگای ئەو دەردەکەون؟ یان کام شت بەلایەوە گران دەبێت و.. چ شتێك دەتوانێت خۆی لێ بشارێتەوە..

ئایا دەگونجێ هیچ شتێك ڕێی شتێکی تری لێ بگرێت؟ یان ئایا دەکرێ شوێنێك هەبێت لە ئامادەبوونی ئەو بێبەش بێت؟ ئایا ئەو خواوەندە - وەك ئیبن عەبباس، خوای لێ ڕازی بێت، فەرموویەتی - دەگونجێ خاوەنی بینین و بیستنێك نەبێت کە هەموو بوونەوەرێك ببینێت و ببیستێت؟

ئایا زنجیرەی شتان بە وێنەی: (تەل و وایەر و دەمار) نابن بۆ جێبەجێ کردنی خێرایی فەرمان و یاساکانی؟ ئایا ڕێگر و تەگەرەکان نابن بە هۆکار بۆ هەڵسوکەوتەکانی؟

ئایا هۆکار و ناوەندەکان نابن بە چەند پەردەیەکی ڕواڵەتیی ڕووت؟

ئایـا ئـه‌وی "بێ مه‌كان" له‌ هـه‌مـوو جێ و شوێنێكـدا ئاماده‌ نابێت؟ ئایا ئیتر پێویستی بـه‌ شـوێن و جێگا ده‌بێت؟

ئایا دووری و بچووكی و په‌رده‌ی چینه‌كانی بوونه‌وه‌ران ده‌توانن ببن به‌ رێگر سه‌باره‌ت به‌ نزیكیی ئه‌و له‌ به‌دیهاتووانی و هه‌ڵسوكه‌وت كردنی تیایاندا و بینینی یه‌ك به‌ یه‌كیان؟

ئایـا ده‌گـونجێت تـایبه‌تكاری‌یه‌كانی شـتانی: مـاددی و، مومـكین و، چـڕ و، زۆر و، به‌سـتراوه‌ و، پابـه‌ند.. هـه‌روه‌ها پێداویستی‌یه‌كانی: مـادده‌ و، ئیمكـان و، چـڕی و، زۆری و، پابه‌ندی و، سنووردارێی چه‌شنی: (ئـاڵوگۆڕ و، لـه‌تبوون و، پارچـه‌ پارچـه‌ بـوون) ڕوو لـه‌و زاته‌ خاوێنـه‌ی خـوا بكـه‌ن كـه‌ خاوێنـه‌ لـه‌ مادده‌یـیه‌ت و، نـووری هـه‌موو نووره‌كانـه‌ و، تـاك و ته‌نیایه‌ و، دوور و خاوێنه‌ له‌: پابه‌ندی و، سنوورداری و، ناته‌واوی؟!

ئایا كۆڵه‌واری شایانی ئه‌وه‌؟.. ئایا ناته‌واوی له‌ داوێنـی عـیززه‌تی شـكۆمه‌ندیی ئـه‌و نزیـك ده‌بێته‌وه‌؟!

نه‌خێر. هه‌زار هه‌زار جار نه‌خێر!

## كۆتایی مه‌به‌ستی دووه‌م

كاتێ كه‌ له‌ تێڕامان و بیركردنه‌وه‌یه‌كی تایبه‌ت به‌ "ئه‌حه‌دییه‌ت"دا ڕۆچووبووم، سه‌یرێكی بـه‌ره‌كانی ئـه‌و دره‌ختـی په‌ڵكـه‌م كـرد كـه‌ لـه‌ ژووره‌كه‌مـه‌وه‌ نزیكـه‌. یه‌كسـه‌ر بـه‌ چـه‌ند ده‌سته‌واژه‌یه‌كی عه‌ره‌بی زنجیره‌ بیركردنه‌وه‌یه‌كم به‌ دڵدا هات. منیش چۆن بـه‌ دڵـمدا هـات، هـه‌روه‌هاش بـه‌ عـه‌ره‌بی تۆمـارم كـردن. وا لێره‌شـدا ده‌یاننووسـینه‌وه‌ و، پاشـان پوختـه‌ ڕوونكردنه‌وه‌یه‌كیان له‌ سه‌ر باس ده‌كه‌ین:

(نعم، فالبذورُ والاثمارُ، والحبوبُ والازهارُ: معجزاتُ الحكمة.. خوارقُ الصنعة.. هدايـا الرحمة.. براهينُ الوحدة.. شواهدُ لطفهِ في دار الآخرة.. شواهدٌ صادقة بان خلاّقها علـى كل شيء قدير وبكل شيء عليم. قد وَسِع كلَّ شيء بالرحمة والعلم والخلق والتدبير والصنع والتصوير. فالشمسُ كالبذرة، والنجمُ كالزهرة، والارضُ كالحبة، لا تثقل عليـه بـالخلق والتدبير، والصُنع والتصوير. فالبذور والاثمار مرايا الوحدة في اقطار الكثرة، اشارات القَـدَر، رموزاتُ القُدْرَة بأن تلك الكثرة من منبع الوحدة تصدرُ شاهدةً لوحدة الفاطر في الصنـع والتصوير. ثم إلى الوحدة تنتهي ذاكرةً لِحكمة الصانعِ في الخلق والتدبير.. وتلويحات الحكمة بأن خالق الكل – بكُلِّية النَظَر الى الجزئي – ينظُرُ ثَمَّ الى جزئه، إذ إن كان ثمراً فهو المقصود الأظهرُ مِن خلق هذا الشجر..

فالبشر ثمرٌ لهذه الكائنات، فهو المقصود الأظهر لخالق الموجودات. والقلب كالنواة، فهو المرآة الأنور لصانع المخلوقات من هذه الحكمة، فالإنسان الأصغر في هذه الكائنات هو المدار الأظهر للنشر والمحشر في هذه الموجودات، والتخريب والتبديل والتحويل والتجديد لهذه الكائنات).

سەرەتای ئەم برگە عەرەبی‌یەش ئەمەی خوارەوەیە:

(فسبحانَ مَنْ جعل حديقةَ أرضه: مشهرَ صَنعتِهِ، محشرَ فطرته، مظهر قدرته، مدارَ حكمته، مزهرَ رحمتِهِ، مزرعَ جنَّتِهِ، ممرَّ المخلوقات، مسيلَ الموجودات، مكيلَ المصنوعات.

فمُزَيَّنُ الحيوانات، منقَّشُ الطويرات، مثمَّرُ الشجرات، مزهَّرُ النباتات: معجزاتُ علمِهِ، خوارقُ صُنعِهِ، هدايا جوده، براهينُ لطفِهِ.

تبسُّمُ الأزهارِ من زينةِ الأثمار، تسجُّعُ الأطيارِ في نسمةِ الأسحار، تهزُّجُ الأمطار على خدود الأزهار، ترحُّمُ الوالدات على الأطفالِ الصغار: تعرُّفُ ودود، تودُّدُ رحمنٍ، ترحُّمُ حنّان، تحنُّنُ منّان، للجن والإنسان، والروح والحيوان، والملك والجانّ).

پوختە ڕوونکردنەوەی ئەم بیرکردنەوەیەی کە بە زمانی عەرەبی بە دڵدا هات، بەم جۆرەیە:

هەموو بەروبوومەکان و گشت تۆوەکانی ناویان: موعجیزاتی دانستی خوای گەورە و.. کاری دەراسای سنعەتی خواوەند و.. دیاریی میهرەبانیی ئیلاهی و.. بەڵگەی مادديی وەحدانییەتن و.. چەند مزگێنی‌یەکن مژدەی لوتف و بەزەیی خواوەندیان پێیە کە لەودنیادا دەیانبەخشێت و.. چەند شایەتێکی ڕاستن لەسەر ئەوەی کە بەدیهێنەریان بەتوانا و ئاگاداری هەموو شتێکە. کەواتە بەر و تۆوەکان لە هەموو گۆشە و هەرێمێکی جیهانی "زۆری"دا ئاوێنەی "تاکی"ی خواوەندن و، لە هەموو لایەکی ئەم جیهانەدا، کە وەك درەخت پەلوپۆی زۆری لێ بووەتەوە، سەرنجەکان لە "زۆری"یەوە بۆ لای "تاکی" ڕادەکێشن!

هەموو بەر و تۆوێك بە زمانی حاڵ دەڵێت: ئەم درەختە مەزنەی کە ئەم هەموو ئەندام و دەمارانەی لێ بووەتەوە پارچە پارچە و بەش بەش نی‌یە، هەرچی لەودایە لە ئێمەشدا هەیە، "زۆری"ی ئەو لە ناوەندی "یەکبوون"ی ئێمەدایە. تەنانەت "تۆو"یش - کە وەك دڵی بەر وایە - ئاوێنەیەکی ماددی‌یە، چونکە لە دڵی خۆی‌دا بە پەنهانی زیکری ناوە جوانەکانی خوا دەکات، بە وێنەی "درەخت" کە بە ئاشکرا ئەو زیکرە دەکات.

ئنجا هەروەك بەر و تۆوەکان ئاوێنەی "وەحدانییەت"ن، چەند ئاماژەیەکی بینراوی "قەدەر" و چەند هێمایەکی "بەرجەستەی قودرەت"یشن، بە چەشنێ کە قەدەر لە ڕێی ئەوانەوە - بە هێما - دەڵێت: ئەم درەختە و سەرجەم لق و پەلە تێك ئالاوەکانی لەم تۆوەوە گەشەیان

کردووە، کەواتە ئەم درەختە لە بواری "دروستکردن و شێوەکێشانی بەدیهاتووان"دا بەڵگەیە لەسەر وەحدانییەتی بەدیهێنەرەکەی.. ئنجا دوای لق لێبوونەوە و زۆربوونی لق و پەلەکانی، حەقیقەتەکەی خۆی لە "بەر"ێکدا و سەرجەم واتاکانیشی لە "تۆو"ێکدا کۆ دەکاتەوە. بەمەش دەبێت بە بەڵگە لەسەر دانستی بەدیهێنەرە مەزنەکەی لە بواری "بەدیهێنان و کارسازی"دا.

هەروەك ئەم درەختە ئاوایە، درەختی بەدیهاتووانیش بە هەمان جۆرە، چونکە درەختی بوونەوەران "بوون"ی خۆی لە سەرچاوەی "وەحدانییەت" وەردەگرێت و هەر بەویش پەروەردە دەبێت و گەشە دەکات و، پاشان بەری "مرۆڤ" دەگرێت، کە لە نێوان ئەم "زۆری"یەی بوونەوەراندا دەبێت بە بەڵگە لەسەر وەحدانییەت. ئەوەتا "دڵ"ی مرۆڤ لە ناوەندی ئەم "زۆری"یەدا بە چاوی ئیمان نهێنیی "وەحدانییەت" دەبینێت.

هەروەها ئەو بەروبووم و تۆوانە چەند ئاماژەیەکن بۆ دانستی پەروەردگار، چونکە "دانست" بە زمانی ئەو بەر و تۆوانە دەدوێت و، هەست و نەستی ئەهلی هەست و شعووریش بۆ ئەمەی خوارەوە بێدار دەکاتەوە:

ڕوانینی هەمەکی و کارسازیی گشتیی ئەم درەختە - بە گشت فراوانی و شموولییەتێکیان - ڕوویان لەم بەرەیە. چونکە ئەو "بەر"ە نموونەیەکی پوخت و بچووکی ئەو درەختەیە و مەبەست لە بوونی درەختەکەدا ئەوە. ئنجا ڕوانینی هەمەکی و کارسازیی گشتی دەڕواننە تۆوی ناو بەروبوومەکە، چونکە "تۆو" ناوەڕۆك و پێڕستی درەختەکەی لە خۆدا هەڵگرتووە. بەو واتایەی کە ئەو کەسەی کاروباری درەخت دەسازێنێت و ئەوانەش کە پەیوەندییان بە کارسازیی درەختەکەوە هەیە، تێکڕا ڕوویان لە یەك بە یەکی بەروبوومەکانی ئەو درەختەیە کە مەبەستی سەرەکین لە بەدیهێنانی ئەو درەختەدا.

پاشان ئەم درەختە زەبەلاحە بۆ مەبەستی نوێکردنەوە و لە پێناوی بەروبوومە وردیلەکانیدا هەندێ لە لق و پەلەکانی هەڵدەپاچرێن و موتوربە دەکرێن تاکو لە ئەنجامدا بەروبوومی باقیی ئەوتۆ بگرن کە گەلێ جوان و ناسکتر بن.

مرۆڤیش، کە "بەر"ی درەختی بوونەوەرانە، بە هەمان جۆرە. چونکە مەبەست لە بەدیهێنانی درەختی بوونەوەراندا گرتنی بەری مرۆڤە، تۆوی ئەو بەرەش "دڵ"ی ئادەمیزادە کە ڕووناکترین و هەمەکیترین ئاوێنەکانی کردگاری شکۆمەندە.

جا لەسەر بناغەی ئەم دانستەیە کە: ئەم مرۆڤە بچووکە بووە بە تەوەرەی گەلێ ئاڵوگۆڕی مەزنی وەك حەشر و نەشر و، هۆی کاولبوون و ئاڵوگۆڕبوونی بوونەوەران. چونکە لەبەر دادگایی کردنی مرۆڤە کە دەرگای دنیا دادەخرێت و هی دواڕۆژ دەکرێتەوە!

مادەم باسی "دوارۆژ" هاتە ئاراوە، ئەوا کاتی باسکردنی ڕاستی‌یەکی ڕوون و گرنگ هاتووە، کە لایەنێکی ڕوانینی ڕوونکردنەوەکانی قورئانی پیرۆز و بەهێزیی دەستەواژەکانی لە بواری چەسپاندنی حەشردا دەردەخات. ئەویش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

ئەنجامی ئەم بیرکردنەوەیە ڕوونی دەکاتەوە کە: لە پێناوی دادگایی کردنی مرۆڤ و شادبوونی‌دا بە بەختەوەریی هەمیشەیی، گەر پێویست بکات سەرجەمی گەردوونیش دەڕووخێنرێت. ئەو هێزەش کە توانای ڕووخاندن و ئاڵوگۆڕکردنی گەردوونی هەیە لە بەرچاودایە. بەڵام "حەشر" دارای چەندەها پلەیە، هەندێکیان: دەبێ بزانرێت و ئیمان هێنان پێی فەرزە لەسەر هەموو کەسێك.. هەندێکی تریشیان: بەپێی پلەکانی بەرزبوونەوەی ڕۆحی و فیکری دەردەکەون و زانینی ئەم بەشەیان لەو پلانەدا پێویستە.

جا قورئانی پیرۆز بۆ ئەوەی بە جۆرێکی بێ‌گومان ئاسانترین و ئاساییترینی پلەکانی حەشر بچەسپێنێت، دەچێ توانستێکی یەکجار مەزن بۆ کردنەوەی فراوانترین و مەزنترین بازنەکانی حەشر دەردەخات!

ئەوەتا ئەو پلەیەی حەشر کە پێویستە هەموان ئیمانی پێ بهێنن بریتی‌یە لەوەی: خەڵکی دوای مردنیان گیانەکانیان دەڕوات بۆ چەند شوێنێکی تر و، جەستەکانیشیان دەبنەوە بە خاك و دەپتورکێن، جگە لە "عَجب الذَّنَب" کە بەشێکی بچووکی جەستەی مرۆڤە و لە حوکمی تۆودایە و دادەڕزێت و خوای گەورەش لە ڕۆژی حەشردا جەستەی مرۆڤ لەسەر ئەم بەشە بچووکە زیندوو دەکاتەوە.

جا ئەم پلەیەی "ئیمان بە حەشر" هێندە ئاسانە کە لە هەموو بەهارێکدا ملیۆنەها نموونەی لەسەر هەیە. کەچی قورئانی پیرۆز بۆ مەبەستی چەسپاندنی ئەم پلە ئاسانە: هەندێ جار توانستێك دەردەخات کە بتوانێت حەشر و نەشری سەرجەمی گەردیلەکان بکات و.. هەندێ جاری تر ئاسەوارەکانی توانست و دانستێك دەخاتە ڕوو کە بتوانن سەرانسەری بەدیهاتووان بۆ نەمان و عەدەم بنێرن و پاشان لەوێوە بیانهێننەوە.. لە هەندێ ئایەتیشیدا شوێنەوار و کارسازیی توانست و دانستێك دەردەخات کە بتوانن ئەستێرەکان بە ئاسماندا بپرژێنن و ئاسمانەکانیش شەق و پەق بکەن و.. لە چەند ئایەتێکی تریدا کارسازیی توانست و دانستێك پیشان دەدات کە بتوانێت بە تەنها یەك هاوار و بە تەنها یەك جار سەرجەمی زیندەوەران بمرێنێت و پاشان زیندوویان بکاتەوە و.. لە چەند ئایەتێکی تریدا توانست و دانستێك ڕوون دەکاتەوە کە بتوانێت یەك بە یەکی زیندەوەرانی ڕووی زەوی بە

جیاجیا حه‌شر و نه‌شر بكات و.. هه‌ندێ جاری تریش شوێنه‌واری توانست و دانستێك پێش چاو ده‌خات كه‌ بتوانێت هه‌موو گۆی زه‌وی هه‌پروون هه‌پروون و چیاكانیش ورد و خاش بكات!

به‌و واتایه‌ی جگه‌ له‌و پله‌یه‌ی حه‌شر، كه‌ ده‌بێ هه‌موان بیزانن و ئیمانیان پێی هه‌بێت، گه‌لێ پله‌ی تری هه‌ن كه‌ ده‌توانرێت به‌و توانست و دانسته‌ بێنه‌ دی.

جا ئه‌گه‌ر دانستی په‌روه‌ردگار خواستی له‌سه‌ر به‌رپابوونی ئه‌و پله‌ زۆرانه‌ی حه‌شر و قیامه‌ت بوو، ئه‌وا بێ هیچ گومانێك هه‌ر هه‌موویان یان هه‌ندێكی گرنگیان، هاوده‌م له‌گه‌ڵ حه‌شر و نه‌شری مرۆڤدا به‌رپا ده‌كات.

**پرسیار ده‌كه‌ن و ده‌ڵێن:**

ئێوه‌ له‌ "وته‌كان"دا زۆر جار "قیاسی ته‌مسیلی" ده‌هێنن. كه‌چی به‌پێی زانیاریی "مه‌نتیق" ئه‌م چه‌شنه‌ قیاسه‌ یه‌قین نابه‌خشێت. خۆ له‌ بابه‌ته‌ یه‌قینی‌یه‌كاندا پێویست به‌ به‌ڵگه‌ی مه‌نتیقی ده‌كات، "قیاسی ته‌مسیلی"ش ته‌نها له‌و چه‌شنه‌ بابه‌تانه‌دا به‌كار ده‌هێنرێت كه‌ پێویستیان به‌ به‌ڵگه‌ی مه‌نتیقی نی‌یه‌ و ته‌نها "ظه‌ننی غالیب" سه‌روزیادیانه‌، به‌پێی بڕیاری زانایانی "ئوصوولی فیقه‌"..

سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه‌ تۆ نموونه‌كان له‌ شێوه‌ی "چیرۆك"دا ده‌هێنیت، خۆ چیرۆكه‌كانیش ئه‌ندێشه‌یین و حه‌قیقی نین و هه‌ندێ جاریش پێچه‌وانه‌ی واقیعن!

**وه‌ڵام:**

به‌ڵێ، له‌ زانیاریی مه‌نتیقدا هاتووه‌ كه‌: "قیاسی ته‌مسیلی" یه‌قینی زانستی به‌ده‌سته‌وه‌ نادات. به‌ڵام ده‌بێ بزانین كه‌ قیاسی ته‌مسیلی جۆرێكی هه‌یه‌ گه‌لێ زیاتر له‌ به‌ڵگه‌ی یه‌قینیی مه‌نتیق به‌هێزتره‌، ته‌نانه‌ت له‌ جۆری یه‌كه‌می شكڵی یه‌كه‌می مه‌نتیق زیاتر یه‌قین ده‌به‌خشێت. ئه‌م جۆره‌ی قیاسی ته‌مسیلی بریتی‌یه‌ له‌:

(ده‌رخستنی به‌ش و چمكێكی ڕاستی‌یه‌كی گشتی به‌ نموونه‌هێنانه‌وه‌یه‌كی جوزئی، پاشان بنیاتنانی بڕیار له‌سه‌ر ئه‌و ڕاستی‌یه‌ و، ڕوونكردنه‌وه‌ی یاسای ڕاستی‌یه‌كه‌ له‌ مادده‌یه‌كی جوزئی و تایبه‌تی‌دا، تاكو به‌ بۆنه‌ی ئه‌و مادده‌یه‌وه‌ ڕاستی‌یه‌ مه‌زنه‌كه‌ بناسرێت و مادده‌ جوزئی‌یه‌كانیشی بۆ لا بگه‌ڕێنه‌وه‌).

بۆ نموونه‌: "خۆر" هه‌رچه‌ند ته‌نها یه‌ك زاتی ته‌نیایه‌، كه‌چی به‌هۆی "نوورانێتی"یه‌وه‌ له‌ نزیك هه‌موو شتێكی بریسكه‌داره‌وه‌ ئاماده‌یه‌. جا به‌م نموونه‌یه‌، یاسای ڕاستی‌یه‌ك ڕوون ده‌كرێته‌وه‌ كه‌ بریتی‌یه‌ له‌وه‌ی: "ڕووناكی" و "شتی نوورانی" پابه‌ند ناكرێن و نابه‌سترێنه‌وه‌، ئه‌وه‌تا دوور و نزیك، كه‌م و زۆریان به‌لاوه‌ یه‌كسانه‌ و "شوێن"یش ناتوانێت سنووریان بۆ دابنێت.

نموونەیەکی تر: نموونە هێنانەوە بە: (پێکهاتن و وێنەکێشانی بەر و گەڵای درەخت لە یەك کاتدا.. بە یەك شێواز.. بە ئاسانی‌یەکی تەواو.. بە جوانترین شێوە.. لە تەنها یەك مەڵبەندەوە.. بە یەك یاسای ئەمری) بۆ مەبەستی پیشاندانی بەشێکی ڕاستی‌یەکی مەزن و چمکی یاسایەکی گشتی‌یە. جا ئەو ڕاستی‌یە و یاساکەی، بە چەشنێکی بێ گومان دەیچەسپێنن کە ئەو بوونەوەرە مەزنانە، وەك ئەم درەختە وان، یاسای ئەم حەقیقەتەیان بەسەردا جێ‌بەجێ دەکرێت. کەواتە ئەوانیش، وەك ئەم درەختە، مەیدانی هاتوچۆکردنی ئەو نهێنی‌یەی تەنیایی (ئەحەدییەت)ی خواوەندن.

سەرجەمی قیاسە تەمسیلی‌یەکانی ناو "وتەکان" لەم جۆرەن، کە لە بەڵگەی بێ گومانی مەنتیقی بەهێزترن و لەو زیاتریش یەقین و دڵنیایی دەبەخشن.

**وەڵامی پرسیاری دووهەم:**

لە هونەری "ڕەوانبێژی"دا زانراوە کە: ئەگەر واتای وشە و گوفتار بۆ مەبەستێکی تری جگە لە واتا سەرەکی‌یەکەی بەکارهێنرابێت، پێی دەوترێت: "لەفزی کینائی" و، ئەو کاتە واتا ئەسڵی‌یەکە لەو لەفزە کینائی‌یەدا "ڕاست و درۆ" ڕووی تێ ناکات. بەڵکو تەنها واتا کینائی‌یەکە بە: "ڕاست" یان "درۆ" وەسف دەکرێت. بەو پێ‌یە ئەگەر واتا کینائی‌یەکە ڕاست بێت ئەوا گوفتارەکە ڕاستە، خۆ ئەگەر واتا ئەسڵی‌یەکە لێرەدا ڕاست نەبێت، زیان لە ڕاستیی واتا کینائی‌یەکە نادات. بەڵام ئەگەر واتا کینائی‌یەکە ڕاست نەبوو ئەوا هەرچەند واتا ئەسڵی‌یەکەش ڕاست بێت گوفتارەکە هەر بە درۆ دادەنرێت!

بۆ نموونە، دەوترێت: "فلانٌ طويلُ النجادِ" واتە: کێلانی شمشێرەکەی فڵانەکەس درێژە..

ئەم گوفتارە کینایەیە لە: درێژیی باڵای ئەو کەسە. جا ئەگەر لە ڕاستی‌دا باڵای بەرز بوو ئەوا گوفتارەکە ڕاستە، هەرچەند شمشێر و کێلانیشی نەبێت. بەڵام گەر باڵای بەرز نەبوو، با شمشێر و کێلانی درێژیشی ببێت، گوفتارەکە هەر بە درۆ دادەنرێت، چونکە واتا ئەسڵی‌یەکەی ئەم گوفتارە مەبەست نەبووە!

جا ئەو چیرۆکانەی کە لە وتەی دەهەم و بیست و دووهەم و هاوچەشنیاندا هێنراون، هەموویان کینایەن و ئەو ڕاستی‌یانەش کە حیکایەتەکانیان کۆتایی پێ دێت و لەوپەڕی ڕاستی و یەکاویەك بووندان لەگەڵ واقیعدا، واتا کینائی‌یەکانی ئەو حیکایەتانەن. واتا ئەسڵی‌یەکانیشیان چاویلکەیەکی تەمسیلین، هەرچی چۆن بن ڕاستی و دروستیی واتا کینائی‌یەکان تێك نادەن. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو حیکایەتانە چەند نموونەهێنانەوەیەکن زمانی حاڵیان لە شێوەی زمانی گوفتار تێدا بەکارهێنراوە و، بۆ مەبەستی تێگەیاندنی عامەی خەڵکیش کەسی مەعنەوی‌یان لە شێوەی کەسی ماددی تێدا دەرخراوە.

# مه‌به‌ستی سێهه‌م

نوێنه‌ر و بانگه‌وازكاری گومڕایی، دوای ئه‌وه‌ی وه‌ڵامی گومانبڕ و قه‌ناعه‌ت به‌خش و ده‌مكوتكه‌ری پرسیاری دووهه‌می وه‌رگرت..

❑ **پرسیاری سێهه‌می ئاراسته كرد و، وتی:**

قورئانی پیرۆز "أحسن الخالقین" و "أرحم الراحمین" و چه‌ند وشه‌یه‌كی تری وه‌ك ئه‌مانه‌ی به‌كارهێناوه كه ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نن چه‌ندین "خالیق" و "راحیم"ی تر هه‌بن..

پاشان ئێوه ده‌ڵێن: په‌روه‌ردگاری عاله‌میان كه‌ماڵێكی نه‌براوه‌ی هه‌یه و ئه‌وپه‌ڕی پله‌ی هه‌موو جۆره‌كانی كه‌ماڵاتی له خۆدا جه‌م كردووه.. كه‌چی كه‌ماڵاتی شتان به دژه‌كانیاندا ده‌ناسرێت، چونكه ئه‌گه‌ر "ئازار" نه‌بوایه "له‌زه‌ت" به كه‌ماڵ دانه‌ئه‌نرا و، گه‌ر "تاریكی" نه‌بوایه "ڕووناكی" نه‌ده‌هاته‌دی و، گه‌ر "جودایی"ش نه‌بوایه "به یه‌ك شادبوون" هیچ له‌زه‌تێكی نه‌ده‌به‌خشی.. هتد؟

**وه‌ڵام:** كه‌رتی یه‌كه‌می پرسیاره‌كه به پێنج ئاماژه وه‌ڵام ده‌ده‌ینه‌وه:

◆ **ئاماژه‌ی یه‌كه‌م:**

قورئانی پیرۆز، هه‌ر له سه‌ره‌تاوه تا كۆتایی، ته‌وحید ڕوون ده‌كاته‌وه و به جۆرێكی بێ‌گومان ده‌یچه‌سپێنێت. ئه‌مه‌ش له خۆی‌دا به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه ئه‌و جۆره وشانه‌ی قورئان ئه‌و واتایانه ناگه‌یه‌نن كه ئێوه لێیان تێ‌ده‌گه‌ن. به‌ڵكو فه‌رمووده‌ی خوای گه‌وره كه ده‌فه‌رموێ: ﴿**أَحسنُ الخالقين**﴾ ئه‌و واتایه ده‌گه‌یه‌نێت كه خواوه‌ند له جوانترینی پله‌كانی خالیقییه‌ت(به‌دیهێنه‌رێتی)دایه. ئه‌م ئایه‌ته هه‌رگیز هیچ به‌ڵگه و نیشانه‌یه‌كی تێدا نی‌یه له‌سه‌ر بوونی به‌دیهێنه‌رێكی تر. چونكه "خالیقییه‌ت" وه‌ك هه‌موو سیفه‌ته‌كانی تر، دارای گه‌لێ پله‌ی زۆر و زه‌به‌نده‌یه. كه‌واته (أحسن الخالقین) ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نێت كه: به‌دیهێنه‌ری مه‌زن له جوانترین و له‌وپه‌ڕی پله‌كانی "خالیقییه‌ت"دایه.

◆ **ئاماژه‌ی دووهه‌م:**

﴿**أَحسنُ الخالقين**﴾ و ده‌سته‌واژه قورئانی‌یه‌كانی تری هاوچه‌شنی، ڕوویان له "فره خالیقی" نی‌یه، به‌ڵكو ڕوویان له جۆره‌كانی "مه‌خلووقییه‌ت"ه. واته ئه‌و خالیقه‌ی كه هه‌موو شتێك به‌دی ده‌هێنێت، به جوانترین شێوه و باشترین پله به‌دیی ده‌هێنێت. ئایه‌تی ﴿**أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ**﴾ هه‌روه‌ها ئایه‌ته پیرۆزه‌كانی تری هاوچه‌شنی، ئه‌م واتایه ده‌رده‌خه‌ن.

◆ **ئاماژەی سێهەم:**

ئەو بەراوردانەی کە لە دەستەواژەکانی وەك: "أحسن الخالقين" و "الله أكبر" و "خير الفاصلين" و"خير المحسنين" و هاوچەشنیاندا هەن، بەراورد و موفازەلە نین لە نێوان چەند سیفاتێکی واقیعیی خوای گەورە و ئەوانەدا کە نموونەی ئەو سیفەت و کردارانەیان لە لایە. نەخێر.. چونکە هەرچی کەمالات هەن لەناو سەرجەمی گەردوون و جیننی و ئادەمیزاد و مەلائیکەتدا، تێکڕا سێبەرێکی لاوازن لەچاو کەماڵی ڕەهای خوای گەورەدا. ئیتر چۆن دەگونجێ بەراوردیان لە نێواندا بکرێت؟ کەواتە بەراوردەکە بە گوێرەی ڕوانینی خەڵکی‌یە بە تایبەت هی بێ‌ئاگایان.

وا نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوە دەهێنینەوە:

"سەربازێك" گوێڕایەڵی و ملکەچیی تەواو لە ڕووی عەریفەکەی‌دا دەنوێنێت و پێی وایە هەموو خێر و چاکەیەکی لە عەریفەکەیەوە دەست دەکەوێت و، مەگەر بە دەگمەن دەنا پادشای هەر بە خەیاڵدا نایەت، خۆ ئەگەر بە خەیاڵیشی‌دا بێت ئەوا هەر منەتباری و سوپاسگوزاری پێشکەشی عەریفەکەی دەکات. جا بەم چەشنە سەربازە دەوترێت: (پادشا لە عەریفەکە گەورەترە و، سوپاس تەنها پێشکەشی ئەو بکە). دیارە مەبەست لەم گوفتارە بەراورد نی‌یە لە نێوان سەرکردایەتیی واقیعیی بەسام و شکۆی پادشا و سەرکردایەتی‌یە جوزئی و ڕواڵەتی‌یەکەی عەریفەکەدا، چونکە هەرگیز بەراورد و "تەفضیل"ی ئاوا هیچ واتایەکی تێدا نی‌یە، بەڵکو بەراوردەکە ڕووی لە پەیوەندی و بایەخدانی سەربازەکەیە بە عەریفەکەی کە لە ڕادەیەکی وادایە بەسەر غەیری خۆی‌دا پێشی دەخات و سوپاس هەر تەنها پێشکەشی ئەو دەکات و هەر تەنها ئەوی خۆش دەوێت!

بە وێنەی ئەم نموونەیە، هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکان، بە وەهمی بێ‌ئاگایان، لە حوکمی بەدیهێنەر و نیعمەت بەخشدان و، دەبن بە پەردە لە ڕووی بینینی نیعمەت‌بەخشی ڕاستەقینەدا. بۆیە ئەوان بە توندی دەست لەو هۆکارە ڕواڵەتی‌یانە گیر دەکەن و پێیان وایە هەموو نیعمەت و چاکەیەك لەو پەردە و هۆکارانەوە هاتووە، ئەوەتا سوپاس و مەدح و سەنایان پێشکەشی ئەوان دەکەن. ئا لێرەدا قورئانی پیرۆز پێیان دەفەرموێ: "الله أكبر"، "أحسن الخالقين"، "خير المحسنين". واتە تەنها ڕوو لەو بکەن و سوپاسی ئەو بکەن.

◆ **ئاماژەی چوارەم:**

هەروەك بەراورد و "تەفضیل" لە نێوان بوونەوەرانی حەقیقی‌دا ساز دەکرێت، لە نێوان شتانی ئیمکانی و گریمان‌کراویشدا دەکرێت. ئنجا هەروەك زۆربەی ماهییەتی شتان چەند

پلەیەکی زۆریان هەیە، بە هەمان جۆر ماهییەتی ناوە جوانەکانی خوای گەورە و سیفەتە خاوێنە شکۆمەندەکانیشی دەکرێ گەلێ پلەی زۆریان تێدا بێت.

جا خوای گەورە لە کاملترین و جوانترینی پلە مومکین و تەسەوورکراوەکاندایە. تەنانەت گەردوون و سەرجەمی کەمالاتی ناویشی شایەتێکی ڕاستن لەسەر ئەم حەقیقەتە و ئایەتی: ﴿لَهُ الأَسْماءُ الحُسنى﴾ کە وەسفە بۆ هەموو ناوەکانی، ئەم واتایە دەردەبڕێت.

◆ **ئاماژەی پێنجەم:**

ئەم بەراورد و موفازەلەیە لە بەرامبەر غەیری خواوە نییە، بەڵکو خوای گەورە دوو جۆر سیفەت و درەوشانەوەی هەیە.

*یەکەم*: کارسازی و ئیش بەڕێ کردنی بۆ شتان لە شێوەی یاسایەکی گشتیدا، کە بە نهێنیی "تاکی" لە ژێر پەردەی "هۆکارەکان"دا ئەنجامیان دەدات.

*دووهەم*: کارسازی و ئیش بەڕێ کردنی ڕاستەوخۆ و تایبەتیی بۆ شتان بەهۆی نهێنیی "تەنیایی"یەوە، بێ بەکارهێنانی پەردەی هۆکارەکان..

کەواتە چاکەی ڕاستەوخۆ و، بەدیهێنانی ڕاستەوخۆ و درەوشانەوەی ڕاستەوخۆی مەزنێتی خوای گەورە بەهۆی نهێنیی "تەنیایی"یەوە، گەلێ مەزنتر و جوانتر و بەرزترە لە چاکەکاری و بەدیهێنان و مەزنێتیی خواوەند کە لە ڕێی هۆکارەکانەوە ئاسەوارەکانیان دەردەکەون.

بۆ نموونە: ئەگەر پادشا لە چینی "ئەولیا"کان بێت و سەرجەمی حوکم و فەرمانڕەوایەتییەکانیش لە دەستی خۆیدا بن، ئەوا کارمەندەکانی دەوڵەتەکەی و سەرکردەکانی سوپاکەی لە پەردە و هۆکار بەولاوە هیچی تر نین.

جا کار بەڕێ کردنی ئەم پادشایە بە دوو جۆرە:

یەکەم: بەو فەرمانانەیە کە دەریان دەکات و بەو ئیجرائاتانەشە کە بە یاسایەکی گشتی و بەهۆی کارمەند و سەرکردە ڕواڵەتییەکان و بە گوێرەی قابیلییەتی پلە و مەقام، ئەنجامیان دەدات.

دووهەم: چاکەکاری و ئیجرائاتە ڕاستەوخۆکانیەتی کە لە ڕێی یاسای گشتییەوە نین و کارمەندە ڕواڵەتییەکانی تێدا نەکردوون بە پەردە.

ئاشکرایە ئەمەی دووهەمیان گەلێ جوان و بەرزترە لەوەی پێشوو، کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەنجام دەدرێت.

خوای گەورەش (ولله المثل الأعلى) کە پادشای ئەزەل و ئەبەد و پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە، بۆ مەبەستی دەرخستنی عیززەت و مەزنیی پەروەردگارێتییەکەی، هۆکارەکانی بە وێنەی پەردە داناوە لە ڕووی بەڕێ کردنی کارەکانیدا.

خۆ جگە لەمە، لە دڵی هەموو بەندەکانیدا تەلەفۆنێکی تایبەتیی داناوە و، فەرمانی ﴿**إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ**﴾ی بۆ دەرکردوون. واتە: بەندایەتی‌یەکی تایبەتیی بۆ دەستنیشان کردوون کە ڕاستەوخۆ بەو تەلەفۆنەی ناو دڵیان ڕوو لەو بکەن و واز لە هۆکارەکان بهێنن و پشتگوێیان بخەن. بەم جۆرە خوای گەورە ڕووی بەندەکانی لە بوونەوەرانەوە بۆ لای خۆی ئاراستە دەکات.

جا فەرمایشتەکانی خوای گەورە: ﴿**أَحسن الخالقين**﴾ و ﴿**أرحم الراحمين**﴾ و هەروەها: "الله أكبر" ئەم واتا ناوبراوەیان لەخۆ گرتووە.

* * *

سەبارەت بە کەرتی دووهەمی پرسیارەکەی نوێنەری گومڕایی، ئەوا وەڵامەکەی لە پێنج هێمادایە:

**○ هێمای یەکەم:**

لە پرسیارەکەدا دەڵێت: هەر شتێك دژی نەبێت چۆن کەماڵی دەبێت؟

**وەڵام:**

خاوەنی ئەم پرسیارە لە "کەماڵی حەقیقی" نەگەیشتووە، چونکە پێی وایە ئەو کەماڵە شتێکی گوێرەیی(نیسبی)یە!

هەموو تایبەتکاری و چاکە و پێشکەوتنێك بەسەر کەسانی تردا، کە لە ئەنجامی بەراورد کردنی نێوان شتانەوە سەر هەڵدەدات، لە ڕاستی‌دا چاکەی ڕاستەقینە و کەماڵی حەقیقی نین، بەڵکو چەند چاکەیەکی نیسبین. ئەوەتا هێندە لاوازن کە ئەگەر بەرامبەرەکەیت پشتگوێ خست و نەتخوێندەوە، ئەوا ئەو چاکە و کەماڵەش بایەخیان نامێنێت و هیچ حسابێکیان بۆ ناکرێت!

بۆ نموونە: لەزەت و تایبەتکاریی "گەرمی" بەهۆی "ساردی"یەوەیە و، لەزەتی نیسبیی "خواردن"یش بە هۆی کاریگەریی "ئازاری برسێتی"یەوەیە. خۆ ئەگەر ئەو کاریگەری‌یانە نەمێنن، چێژ و لەزەتەکانیش نامێنن، یان کەم دەبنەوە.

بەڵام لەزەت و خۆشەویستی و چاکە و کەماڵی "حەقیقی" ئەوانەن کە لەسەر بناغەی تەسەوور کردنی غەیری خۆیان و بەراوردکردنیان لەگەڵ ئەو غەیرەدا بنیات نەنرابن، بەڵکو خۆیان لە زاتی خۆیاندا وجوودیان بێت و، ڕاستی‌یەکی ڕەگداکوتاو بن، وەك: لەزەتی وجوود و، ژیان و، خۆشەویستی و، خواناسی و، ئیمان و، مانەوە و، میهرەبانی و، شەفەقەت.. هەروەها وەك جوانیی: ڕووناکی و، بینین و، گوفتار و، سەخاوەت و،

ڕەوشت و، شێوە و ڕوخسار.. هەروەها وەك کەماڵی: زات و، سیفەت و، کردار.. ئەمانە و تایبەتکاریی‌یە زاتیی‌یەکانی تری هاوچەشنیان، کە هەرگیز بە "بوون" یان بە "نەبوون"ی غەیری خۆیان ئاڵوگۆڕیان بەسەردا نایەت، بە: لەزەت و جوانی و کەماڵی "حەقیقی" دادەنرێن.

جا کەمالاتی بەدیهێنەری خاوەن کەماڵ و کردگاری شکۆمەندی خاوەن جوانی، هەموویان زاتی و حەقیقین، هەرگیز غەیری خوای گەورە کاریان تێ ناکات.

**○ هێمای دووهەم:**

"سەیید شەریفی جورجانی"[1] لە کتێبی "شرح المواقف"دا دەڵێت: (هۆکاری خۆشەویستی: یان لەزەتە، یان بەرژەوەندیی‌یە، یان هاوڕەگەزێتیی‌یە، یان کەماڵە. چونکە کەماڵ لە خۆیدا خۆش ویستراوە).

واتە: هەر شتێکت خۆش ویست یان لەبەر لەزەت خۆشت دەوێت، یان لەبەر سوود و بەرژەوەندی، یان لەبەر هاوڕەگەزی - وەك حەز کردن لە منداڵ - یان لەبەر ئەوە خۆشت دەوێت کە دارای کەماڵە. جا ئەگەر هۆکاری خۆشەویستیی‌یەکە "کەماڵ" بوو، ئەوا پێویست بە هۆکارێکی تری خۆشەویستی ناکات، چونکە کەماڵ هەر لە خۆیدا مایەی خۆشویستنە.

نموونەی ئەمە وەك: خۆشویستنی خاوەن فەزڵ و پیاوچاکانی پێشینان لە لایەن خەڵکی‌یەوە، ئەوەتا بێ ئەوەی هیچ پەیوەندیی‌یەك لە نێوانیاندا هەبێت بیان‌بەستێت بە یەکەوە، کەچی خۆشیان دەوێن و ڕێزیان لە بەرامبەرەوە بۆ دەردەبڕن.

جا کەماڵی خوای گەورە و کەماڵی هەموو پلەیەکی سەرجەمی ناوە جوانەکانی ئەو، هەموویان کەماڵی ڕاستەقینەن. بۆیە لە زاتی خۆیاندا مایەی خۆشویستنن.

خوای گەورەش کە خۆشەویستی حەقیقی و خۆش ویستراوی حەق و ڕاستەقینەیە، بە خۆشەویستیی‌یەکی شایانی خۆی: کەماڵی حەقیقی و جوانیی سیفات و ناوە جوانەکانی خۆی خۆش دەوێت و، هەروەها جوانیی سنعەت و بەدیهاتووەکانیشی خۆش دەوێت کە هۆی دەرکەوتن و ئاوێنەی ئەو کەماڵەن. لەبەر ئەوە، گشت پێغەمبەران و ئەولیاکانیشی خۆش دەوێت، بە تایبەت پێشەوای پێغەمبەران و پادشای ئەولیاکان و خۆشەویستی پەروەردگاری جیهانیان ﷺ.

---

(١) سەیید شەریفی جورجانی زانایەکی بەرز و بەڕێزی چەرخی خۆی بووە و لە ساڵی (٨٣٨ ك - ١٤٣٤ز) کۆچی دوایی کردووە. گەلێ بەرهەمی زانستیی دوای خۆی جێ هێشتووە، وەك: "الرشاد في شرح الإرشـــاد" و، شەرحی "إرشاد الساري"ی تەفتازانی کە لە زانستی "نەحوو"دایە و، وەرگێڕانی نامیلکەیەك لە مەنتیقدا کە باوکی بە زمانی فارسی دایناوە و، دانانی کتێبی "الغرة" لە مەنتیقدا و، لە هەموویان گرنگتر: شەرحی کتێبی "المواقف"ی "عەزودەددینی ئیجی"یە لە زانستی "کەلام"دا. (وەرگێڕ)

واتە: لەبەر ئەوەی جوانی‌یەکەی خۆی خۆش دەوێت، ئەوا خۆشەویستەکەشی ﷺ خۆش دەوێت، چونکە ئاوێنەی جوانی‌یەکەیتی..

هەروەها لەبەر ئەوەی ناوە جوانەکانی خۆی خۆش دەوێت، ئەوا خۆشەویستەکەی خۆی ﷺ و برایانی ئەویشی خۆش دەوێت، چونکە هەر ئەو خۆشەویستە خاوەن هەست و شعوورەیەتی کە بە تەواوی پەی بەو ناوانە ببات..

هەروەها لەبەر ئەوەی سنعەتەکەی خۆی خۆش دەوێت، ئەوا خۆشەویستەکەی ﷺ و هاووێنەی ئەویشی خۆش دەوێت، چونکە سنعەتی ئەو ئاشکرا دەکات و خەڵکی‌یان بۆ لا ڕێنمایی دەکات..

هەروەها لەبەر ئەوەی بەدیهاتووانی خۆی خۆش دەوێت، ئەوا خۆشەویستەکەی ﷺ و هەموو ئەوانەشی خۆش دەوێت کە بە ڕێ و شوێنی ئەودا دەڕۆن، چونکە هەر ئەوە کە نرخ و بەهای بەدیهاتووانی دەزانێت و پیرۆزبایی‌یان لێ دەکات و دەفەرموێ: "ماشاء الله چەندە جوان بەدی هێنراون"!

هەروەها لەبەر ئەوەی جوانیی بەدیهاتووانی خۆی خۆش دەوێت، ئەوا خۆشەویستەکەی ﷺ و شوێنکەوتووان و برایانی ئەویشی خۆش دەوێت، چونکە هەر ئەوە هەموو ڕەوشتە بەرزەکانی لە خۆی‌دا جەم کردبێت.

○ **هێمای سێهەم:**

هەموو جۆرەکانی کەماڵی ناو گەردوون نیشانە و ئاماژەن بۆ کەماڵ و جوانیی زاتی مەزنی پەروەردگار. تەنانەت هەرچی جوانی و کەماڵ هەن تەنها سێبەرێکی لاوازن لە چاو کەماڵی ڕاستەقینەی ئەودا. وا لێرەدا ئاماژە بۆ پێنج بەڵگەی ئەم ڕاستی‌یە دەکەین:

**بەڵگەی یەکەم:** هەموو کۆشکێکی مەزنی نەخشێنراوی ڕازاوە - بە ئاشکرا - بەڵگەیە لەسەر وەستایەکی کارامە. چونکە کاری کامڵ و ڕێکوپێك و ڕەنگین (کە لەم نموونەیەدا سنعەت و نەخشی ناوازەیە) بە ئاشکرا بەڵگەیە لەسەر بوونی بکەر و وەستا و ئەندازیارێکی کامڵ و، ئاماژە دەکات بۆ ناونیشان و ناوەکانی ئەو وەستا و ئەندازیارە، وەك ناونیشان و ناوی: (نەخش و نیگارکێش و، وێنەکێش). ئنجا ئەو ناوە کامڵانەش بێ گومان بەڵگەن لەسەر سیفەتی سنعەتە کامڵەکەی ئەو وەستایە، ئنجا کەماڵی ئەم سنعەت و سیفەتانەش بە ڕوونی بەڵگەیە لەسەر کەماڵی توانا و لێهاتنی ئەو وەستایە، ئنجا ئەو توانا و لێهاتنە کامڵانەش بێ گومان بەڵگەن لەسەر کەماڵی زاتی خودی وەستاکە و لەسەر بەرزیی ماهییەتەکەی.

بە وێنەی ئەم نموونەیە، کۆشکی جیهانیش کە بریتی‌یە لەم ئاسەوارە ڕازاوە و کامڵە، بە ئاشکرا و بەداهەت بەڵگەیە لەسەر چەند کردارێك کە لەوپەڕی کەماڵدان، چونکە جۆرەکانی کەماڵی ناو و ئاسەوار و شوێنەوارەکان لە کەماڵی کردارەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە..

كه‌ماڵی كرداره‌كانیش به ئاشكرا به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر كه‌سێكی بكه‌ری خاوه‌ن كه‌ماڵ و له‌سه‌ر كه‌ماڵی ناوه‌كانی وه‌ك: "المدبر والمصور والحكيم والمزين" و ناوه‌كانی تری هاوچه‌شنیان كه په‌یوه‌ندی‌یان به ئاسه‌واره‌كه‌وه هه‌یه..

ئنجا بێ‌گومان كه‌ماڵی ناونیشان و ناوه‌كانیش به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر كه‌ماڵی وه‌سفه‌كانی ئه‌و بكه‌ره خاوه‌ن كه‌ماڵه، چونكه ئه‌گه‌ر سیفه‌ته‌كان كامڵ نه‌بن ئه‌وا ئه‌و ناوانه‌ی كه لێیانه‌وه په‌یدا ده‌بن هه‌رگیز كامڵ نابن..

هه‌روه‌ها كه‌ماڵی ئه‌و وه‌سفانه به ئاشكرا به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر كه‌ماڵی كاروباره زاتی‌یه‌كانی، چونكه بنه‌مای سیفه‌ته‌كان ئه‌و كاروباره زاتی‌یانه‌ن..

ئنجا كه‌ماڵی كاروباری زاتیش به ئه‌ندازه‌ی "علم اليقين" به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر كه‌ماڵی زاتێكی مه‌زنی خاوه‌ن كاروبار، به‌ڵگه‌یه‌كی هێنده بێ‌گومان كه ڕووناكیی ئه‌و كه‌ماڵه هه‌رچه‌نده‌ش به‌ناو په‌رده‌كانی: كاروباره‌كان و، سیفه‌ته‌كان و، ناوه‌كان و، كرداره‌كان و، ئاسه‌واره‌كاندا تێپه‌ڕ بووه، كه‌چی هێشتا هه‌ر "جوانی" و "كه‌ماڵ"ی له‌م گه‌ردوونه‌دا به ئاشكرا پێش‌چاو خستووه.

ئایا دوای چه‌سپاندنی بوونی كه‌ماڵێكی زاتی و حه‌قیقیی تا ئه‌م ڕاده‌یه، ئیتر ده‌بێ كه‌ماڵی نیسبی چ بایه‌خێكی هه‌بێ، كه پابه‌ندی غه‌یری خۆیه‌تی و، له چاو هاوچه‌شنه‌كانی و به سه‌ركه‌وتنی به‌سه‌ر دژه‌كانی‌دا "بوون" به‌ده‌ست ده‌هێنێت؟ ئایا ئه‌م كه‌ماڵه نیسبی‌یه له چاو ئه‌و حه‌قیقی‌یه‌دا كه‌ماڵێكی كز و خامۆش نی‌یه؟!

**به‌ڵگه‌ی دووه‌م**: كاتێك مرۆڤ به چاوی په‌ند لێ وه‌رگرتن ده‌ڕوانێته ئه‌م گه‌ردوونه، دڵ و ویژدانی به "حه‌دس"ێكی ڕاست، هه‌ست ده‌كات كه: ئه‌و كه‌سه‌ی به جۆره‌ها جوانی بوونه‌وه‌ران ئارایشت ده‌دات، بێ هیچ گومانێك خاوه‌نی جوانی و كه‌ماڵێكی نه‌بڕاوه‌یه، بۆیه جوانی و كه‌ماڵ له كاره‌كانی‌دا ده‌رده‌كه‌وێت.

**به‌ڵگه‌ی سێهه‌م**: ئاشكرایه كه سنعه‌ته هاوسه‌نگه ڕێكوپێك و جوانه‌كان، به‌پێی "به‌رنامه"یه‌ك دروست كراون كه له‌وپه‌ڕی جوانی و ورده‌كاری‌دایه.. هه‌روه‌ها به‌رنامه‌ی كامڵ و ورد و جوانیش به‌پێی زانست و زه‌ینێكی جوان داڕێژراوه و پاڵی به توانا و لێهاتنێكی ڕۆحیی كامڵه‌وه داوه. ئه‌مه‌ش ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نێت كه جوانیی مه‌عنه‌ویی ڕۆح به‌هۆی زانسته‌وه له سنعه‌تدا ده‌رده‌كه‌وێت.

هه‌موو ئه‌م بوونه‌وه‌رانه و ئه‌و شتانه‌ش له ناویاندان و، سه‌رجه‌می جوانی‌یه ماددی‌یه‌كان كه له ژماره نایه‌ن، ته‌نها چه‌ند نمێكی جوانی‌یه مه‌عنه‌وی و زانستی‌یه‌كانن، ئه‌و جوانی و كه‌ماڵه زانستی و مه‌عنه‌وی‌یانه‌ش بێ‌گومان دره‌وشانه‌وه‌ی جوانی و كه‌ماڵێكی هه‌تاهه‌تایین.

**بەڵگەی چوارەم:** ئاشکرایە کە ئەو شتەی ڕووناکی پەخش دەکات، دەبێ خۆیشی ڕووناك بێت و.. کرداری خێر و چاکەش بە دەست ڕۆیشتن دەکرێت و.. نەرمونیانیش لە شتی ناسك و نیانەوە پەیدا دەبێت. لەبەر ئەوە، بەخشینی جوانی و جۆرەهای کەمالات بە بوونەوەران بەڵگەیە لەسەر جوانی و کەماڵێکی هەمیشەیی، بە وێنەی ڕووناکی کە دەبێت بە بەڵگە لەسەر "خۆر".

هەروەك ڕووبارەکان بە لێ‌درەوشانەوەی خۆر دەبریسکێنەوە، ئەم بوونەوەرانەش بە وێنەی ڕووباری مەزن بەخوڕ دێن و دەڕۆن، بەچەشنێکی کاتی -یەك لە دوای یەك- جوانی و کەماڵیان تێدا دەبریسکێتەوە، پاشان هەریەکەیان دەڕۆن بە ڕێی خۆیانەوە. لەم بە دوای یەکتر هاتنەی بریسکانەوەی ئەوانەوە دەردەکەوێت کە جیلوە و جوانیی ئەو ڕووبارە بە خوڕەمە هی زاتی خۆی نی‌یە، بەڵکو جوانی و درەوشانەوەی خۆرێکی ڕووناکە. کەواتە هەرچی جوانی و کەمالات - بە چەشنێکی کاتی - بەسەر لافاوی بوونەوەرانەوە دەبریسکێنەوە، تەنها بریسکانەوەی جوانیی ناوەکانی ئەو کەسەن کە "نوور"ی سەرمەدی‌یە!

نعم! تفانـي المرآة.. زوال الموجودات، مع التجلّي الدائم.. مع الفيض الملازم، من اظهر الظواهر، من أبهر البواهر على أن: الجمال الظاهر.. أن الكمال الزاهر، ليسا مُلْكَ المظاهر. من أفصح تبيان.. من أوضح برهانٍ، للجمال المجرَّدِ.. للإحسان المجدَّدِ، للواجب الوجود.. للباقي الودود.

**بەڵگەی پێنجەم:** ئاشکرایە کە ئەگەر چەند کەسێکی جیاواز لە چەند ڕێگایەکی جیاجیاوە هاتبن و هەر هەمووشیان ڕووداوێکی دیاریکراو وەك خۆی بگێڕنەوە، ئەوا ئەم گێڕانەوەیە بە تەواتور دەبێت بە بەڵگەیەکی دڵنیایی‌بەخش لەسەر بوونی ئەو ڕووداوە.

هەموو ئەهلی کەشف و زەوق و شهوودی چینە جیاجیاکانی لێکۆڵەران و، ڕێگا جۆراوجۆرەکانی ئەولیاکان و، ڕێبازە لەیەك نەچووەکانی ئەصفیاکان و، ڕێبڕەوە جیاجیاکانی دانا لێکۆڵەرەکان، کە مەشرەب و ڕێباز و لێهاتن و سەردەمەکانیشیان گەلێ جیاواز و جۆراوجۆرن، بە کەشف و زەوق و شهوود قسەیان لەسەر ئەوە یەکانگیر بووە کە: (هەرچی جوانی و کەمالات لە ڕووی بوونەوەران و ئاوێنەکانی بەدیهاتووواندا دەردەکەون، تەنها درەوشانەوەی کەماڵی زاتێکی مەزن و جوانیی ناوەکانی ئەون).

جا یەکگرتنی هەموو ئەوانە لەسەر ئەم ڕاستی‌یە، بەڵگەیەکی گومانبڕی نەجووڵ و یەکدەنگی‌یەکی مەزنی وەهایە کە زامدار ناکرێت.

پێم وایە "نوێنەری گومڕایی" ناچارە هەڵبێت و گوێی خۆی بئاخنێت، نەبادا ڕاستی‌یەکانی ئەم هێمایە ببیستێت!

بەڵێ، مێشکە تاریکەکان، بە وێنەی شەمشەمەکوێرەن، توانای بینینی ئەم ڕووناکی‌یانەیان نی‌یە. بۆیە وا ئێمەش بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نادەین!

**○ هێمای چوارەم:**

لەزەت و جوانیی هەرشتێك زیاتر بۆ هاووێنە و دژەکانی ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ دیاردەکانی دەگەڕێتەوە. بۆنموونە: "کەرەم"(بەخشندەیی) سیفەتێکی خۆش و جوانە. مرۆڤی "کەریم"(بەخشندە) لەزەتێکی خۆش دەچێژێت کە دەبینێت کەرەم لەگەڵ کراوەکانی لەزەت لەو کەرەمە دەبەن و، بە شادمانی و خۆشحاڵیی ئەوان هەزار جار زیاتر لەزەت دەچێژێت، لە چاو ئەو لەزەتە نیسبی‌یەی کە بەدەستی دەهێنێت لە سەرکەوتنی بەسەر هاوەڵە سەخاوەتمەندەکانی‌دا!

بە هەمان جۆر، مرۆڤی خاوەن شەفەقەت و بەزەیی، بە ئەندازەی حەوانەوەی گشت ئەو کەسانەی کە شەفەقەتیان لە ڕوودا دەنوێنێت، لەزەتی ڕاستەقینە دەچێژێت.

ئەوەتا ئەو لەزەتەی کە دایك لە حەوانەوە و بەختەوەریی منداڵەکانیەوە بەدەستی دەهێنێت، هێندە بەهێز و ڕەگداکوتاوە کە گیانی خۆیشی لە پێناوی حەوانەوەی ئەواندا بەخت دەکات. تەنانەت لەزەتی ئەو شەفەقەتە "مریشك" هان دەدات کە بۆ پاراستنی جووجەڵەکانی، هێرش بۆ سەر شێر بەرێت!

کەواتە "لەزەت" و "جوانی" و "کەماڵ" و "بەختەوەریی ڕاستەقینە"ی وەسفە بەرزەکان، ناگەڕێنەوە بۆ هاوتا و دژانێك کە بۆیان تەسەوور دەکرێت. بەڵکو ڕوویان لەو شتانەیە کە وەك ئاوێنە وان و تیایاندا دەردەکەون و پەیوەندی‌یان پێیانەوە هەیە.

بۆ نموونە: جوانیی میهرەبانیی خواوەندی (جوان و، خاوەن کەماڵ و، حەیی و قەییوم و، حەننان و، مەننان و، ڕەحمان و، ڕەحیم) ڕووی لەو ڕەحم پێ کراوانەیە کە بەزەیی و سۆز و میهرەبانیی ئەویان دەست کەوتووە، بە تایبەت ئەوانەی کە لە بەهەشتی هەمیشەیی‌دا جۆرەهای بەزەیی و میهرەبانیی فراوان و شەفەقەتی ئەویان بەدەست هێناوە..

هەروەها خوای گەورە خاوەنی شتێکی وەك "مەحەببەت"ە کە شایانی زاتی خاوێنی ئەو بێت، بە ئەندازەی خۆشحاڵی و بەختەوەریی بەدیهاتووانی.

هەروەها گەلێ "کاروبار"ی بەرز و جوان و موقەددەسی هەن کە تابلێی خاوێنن و، واتای ئەوتۆیان هەیە کە شایانی خوای گەورەن و، ئێمە ناتوانین لەبەر نەبوونی ئیزنی شەرعی باسیان بکەین، لەو تەعبیرە یەکجار خاوێن و موقەددەسانەی کە بە: لەزەتی موقەددەس و عیشقی موقەددەس و خۆشحاڵیی مونەززەهـ و قودسی، تەعبیر دەکرێن. بە چەشنێ کە هەریەکەیان لە چەندەها پلەی بەرزی و قودسی و نەزاهەتدان و، چ لەناو بوونەوەراندا و چ

لەو عیشق و خۆشحاڵی‌یەش کە لەواندا هەستی پێ دەکرێت، دەردەکەون. وەك لە زۆر شوێندا چەسپاندوومانە.

ئەگەر دەتەوێت سەیری بریسکانەوەیەکی ئەو واتا مەزنانە بکەیت، ئەوا فەرموو بە چاویلکەی ئەم نموونەیە سەیری بکە:

مرۆڤێکی سەخاوەتمەند و بەبەزەیی و خاوەن بەخشندەیی و میهرەبانی، میوانداری‌یەکی ڕەنگینی لەسەر یەکێك لە کەشتی‌یە گەڕۆکەکانی‌دا بۆ هەزاران ئامادە کرد و، خۆیشی لە گۆشەیەکەوە سەیری دەکردن و دەیبینی کە چۆن بە سوپاس و پێزانینەوە لە بەخششەکانی ئەو بەهرەمەند دەبن! جا ئایا دەبێ ئەو مرۆڤە سەخاوەتمەندە چەندە خۆشحاڵ و شادمان بێت کە چاوی لەم دیمەنیە و، لەزەت چەشتنی ئەو هەزار و برسی‌یانە دەبینێت و، سوپاس و ڕەزامەندیی ئەو موحتاجانە بەدەست دەهێنێت؟! دەتوانیت بۆ خۆت لێکی بدەیتەوە و هەڵی بسەنگێنیت.

لە کاتێکدا مرۆڤ کە خاوەنی ڕاستەقینەی میوانداری‌یەکی بچووکیش نی‌یە و، لەو میوانداری‌یەدا جگە لە ئامادەکردن و سفرە ڕاخستن چیی تری لە ئەستۆدا نی‌یە، تا ئەم ڕادەیە لەزەت بچێژێت و خۆشحاڵ بێت بە ڕێزنانی لە خەڵکی لەم میوانداری‌یە جوزئی‌یەدا..

دەبێ ئەو کەسە چۆن بێت کە لە لایەن جینی و ئینس و زیندەوەرانەوە دەستی نزا و سەنا و ستایش و ڕەزامەندیی بۆ بەرز دەکرێتەوە و حەمد و سەنا و سوپاسی دەکرێت، لەسەر ئەوەی کە لەم کەشتی‌یە پەروەردگاری‌یە مەزنەی گۆی زەوی‌دا هەڵی گرتوون و، بە ناو دەریای فەزای ئەم جیهانەدا دەیانگێڕێت و، نیعمەتە ئاشکرا و پەنهانەکانی خۆی بە سەردا باراندوون و، هەموو زیندەوەر و خاوەن ژیانێکی بانگێشتی ئەو میوانداری‌یە کردووە کە وەك بەرکولێکی سادە وایە لەچاو سفرەی ڕاخراوی خانەی هەمیشەیی‌دا، کە هەموو یەکێك لە بەهەشتەکانی ئەو خانەی هەمیشەیی‌یە بە وێنەی سفرەیەکی ڕاخراو وایە لە بەردەم ئەواندا و، پڕە لەو شتانەی کە دەروونەکان ئیشتیهای دەکەن و چاوەکانیش لەزەتی لێ دەبەن و، بۆ بەندە لەژمارەنەهاتووەکانی ئامادەی کردوون، ئەوانەی کە لەوپەڕی شەوق و موحتاجی‌دان بۆ چەندین چێژ و لەزەتی لەسنووربەدەر، تاکو لایەنە ناسك و نیانە بێ سنوورەکانی خۆیانی پێ تێر بکەن و، لەو میوانداری‌یە ڕاستەقینەیەدا.. بە نیعمەتێکی ڕاستەقینە.. لە زەمەنێکی نەبڕاوەی هەمیشەیی‌دا، لێی بەهرەمەند بن!!

ئیتر بۆ خۆت لێرەدا هەموو ئەو واتا موقەددەسانەی "مەحەببەت" و ئەو تەعبیرە خاوێنانەی کە ئەنجامی "میهرەبانی"ی خواوەندی ڕەحمان و ڕەحیمن و، ئێمە لە تەعبیرکردنیاندا دەستەوەسانین، قیاس بکە و لێکیان بدەرەوە.

نموونەیەکی تر:

ئەگەر وەستایەکی کارامە ئامێری "گرامافۆن"ێکی وا ناوازە دروست بکات کە بێ هیچ پێویستی‌یەك بە "قەوان" قسە بکات و، ئنجا بۆ تاقیکردنەوە لە پێش‌چاوی خەڵکی‌دا بەکاری بهێنێت و، ئەم ئامێرەش لەم کاتەدا بە باشترین شێوە کارەکەی ڕاپەڕێنێت و ویست و نیازی وەستاکەی بهێنێتەدی.. ئایا ئەو وەستایە بە بینینی سنعەتەکەی لەسەر ئەم شێوەیە، چەندە دڵخۆش دەبێت و چەندە لەزەت لە کارەکەی دەبات و شانازیی پێوە دەکات، تەنانەت لە خۆشحاڵی‌دا چەندە "بارك الله" لەبەر خۆیەوە دووپات دەکاتەوە!!

جا ئەگەر مرۆڤێکی بچووکی دەستەوسان لە بواری دروستکردن و داهێناندا، تەنها بە سنعەتێکی ئاوا بچووك تا ئەم ڕادەیە نوقمی شادمانی و خۆشحاڵی ببێت، دەبێ کردگاری مەزن چۆن بێت کە ئەم گەردوونەی لەسەر شێوەی مۆسیقا و گرامافۆنێکی مەزندا بەدی هێناوە بە تایبەت زایەڵەی تەسبیحاتی زیندەوەرانی ڕووی زەوی و تایبەت‌تریش ئەو ئامێری گرامافۆنە پەروەردگاری و مۆسیقا خوایی‌یەی لە سەری مرۆڤدا داینا‌وە، کە دانست و زانستی مرۆڤ بە سەرسامی و حەپەسانەوە لە بەرامبەریەوە بەچۆکدا هاتوون!!

بەڵێ، هەموو "بەدیهاتووان" بەوپەڕی جوانی و کەماڵەوە، ئەو ئەنجامانە دەردەخەن کە لێیان داوا دەکرێت. ئەمەش لە ڕێی ملکەچ بوونیان بۆ فەرمانە تەکوینی‌یەکان کە بە: "عیبادەت" و "تەسبیحات" و "تەحیات"ی تایبەتیی ئەوان تەعبیر دەکرێن. ئیتر لەم ڕێیەوە ئەو ئامانج و مەبەستە پەروەردگاری‌یانەی کە تیایاندا ڕەچاو کراوە، دێنەدی. بەمەش هێندە شانازی و منەت و خۆشحاڵی و واتا و کاروباری تری خاوێن و موقەددەس دێنەدی کە ئێمە لە دەربڕینیاندا دەستەوسانین و، هێندەش بەرز و موقەددەسن کە ئەگەر سەرجەمی ژیری‌یەکانی مرۆڤ لە عەقڵی یەك کەسدا کۆ ببنەوە هێشتا ناتوانن بە تەواوی لێی تێبگەن و پەیی پێ ببەن!

نموونەیەکی تر:

"فەرمانڕەوای دادگەر" کاتێ کە مافی ستەم لێکراو لە ستەمکار دەسێنێتەوە و حەق دەگێڕێتەوە شوێنی خۆی، هەست بە چێژ و لەزەت دەکات و.. پاراستنی لاوازانی لە شەڕی بەهێزان پێ شانازی‌یە و.. خۆشحاڵە بەوەی کە هەرکەسە و مافی خۆی بداتێ.

دەتوانیت لەم نموونەیەوە قیاسی هاتنەدیی ئەو واتا موقەددەسانە بکەیت کە لەو دەمانەدا خواوەندی خاوەن دانست و دادگەریی ڕەها و، قەهھاری شکۆمەند، نەك تەنها لەناو جینني و مرۆڤدا، بەڵکو لە سەرجەمی بوونەوەراندا، حەق جێگیر دەکات! واتە کە هەل و مەرجی ژیان لە شێوەی "مافی ژیان"دا بە سەرجەمی بوونەوەران بە تایبەت زیندەوەران

دەبەخشێت، بەوەی کە بە چاکە و بەخششی خۆی چەندین ئامێر و کۆئەندامی ئەوتۆیان دەداتێ پارێزگاریی ژیانیان بکات و لە مەترسیی دەستدرێژکاران بیانپارێزێت و بوونەوەرە ترسناکەکانیش لە سنووری خۆیاندا ڕابگرێت.

ئەمە جگە لەو واتا موقەددەسانەی کە هەڵقوڵاوی درەوشانەوەی هەرە مەزنی: "دادگەری"ی کامڵ و "دانست"ی تەواوی حەشری هەرە مەزنن لەودنیادا، کە درەوشانەوەیەکی هێندە مەزنە نەك هەر جینی و مرۆڤ بەڵکو سەرانسەری زیندەوەرانی تریش دەگرێتەوە.

بە وێنەی ئەم سێ نموونەیە، هەموو یەکێك لە هەزار و یەك ناوە جوانەکانی خوای گەورە، چەندین پلە و چینی زۆر و زەبەندەی "جوانی" و "فەزڵ" و "کەماڵ"یان هەیە، هەروەك گەلێ پلەی زۆر و زەبەندەی "خۆشەویستی" و "شانازی" و "عیززەت" و "مەزنێتی"یان تێدایە. بۆیە ئەو پیاوچاك و ئەولیا لێکۆڵەرانەی کە بەهرەمەندی ناوی جوانی "الودود"ی خوای گەورە بوون، وتوویانە: کاکڵە و هەوێن و گەوهەری گەردوون سەرتاپا "مەحەببەت"ە و، جموجوڵی بوونەوەرانیش بە "مەحەببەت" ئەنجام دەدرێت و، هەموو یاساکانی کێشبوون و کێش کردن و کێش (الإنجذاب والجذب والجاذبية) کە لە بوونەوەراندا دەست بەکارن، تێکڕا لە "مەحەببەت"ەوە هاتوون! ئەوەتا یەکێك لەوانە وتوویەتی:

فَلَكْ مست، مَلَك مست، نجوم مست.
سموات مست، شمس مست، قمر مست، زمين مست.
عناصر مست، نبات مست، شجر مست، بشر مست.
سراسر ذی حيات مست.
همه ذرات موجودات برابر مست درمست است.

بەو واتایەی کە: هەموو شتێك، بەپێی توانا و لێهاتنی خۆی، بەهۆی درەوشانەوەی "مەحەببەتی ئیلاهی"یەوە، مەستی شەرابی مەحەببەتە.

ئاشکرایە هەموو دڵێك ئەو کەسەی خۆش دەوێت کە چاکەی لەگەڵدا کردووە و، کەماڵی ڕاستەقینەی خۆش دەوێت و، شەیدای جوانیی بەرزی بێ وێنەیە و، خۆشەویستییەکەشی بۆ ئەو کەسە پتر زیاد دەکات کە خۆشەویستانی ئەویان خۆش دەوێت و شەفەقەت و چاکەیان لە ڕوودا دەنوێنێت.

ئایا دەبێ مەودای ئەو عیشق و مەحەببەتە چەندە بێت کە شایانی کەسێکە هەزار و یەك گەنجینەی چاکەکاری و نیعمەت بەخشینی لە یەك بە یەکی ناوەکانیدا داناوە و، خۆشەویستانمان بەختەوەر دەکات و، سەرچاوەی هەزاران جۆری کەمالاتە و، مایەی

سەرهەڵدانی هەزاران چینی جوانی‌یە و، هەزار و یەك ناوی هەیە و، جوانی خاوەن جەلال و مەحبووبی خاوەن کەماڵە؟!

ئایا لەمەوە مەودای لەسەر حەق بوونی "مەستیی سەرتاپای گەردوون" بە خۆشەویستی ئەو، دەرناکەوێت؟

لەبەر ئەم نهێنی‌یەیە کە هەندێك لەو ئەولیایانەی شەرەفمەندی بەهرە لێ وەرگرتنی ناوی "الودود"ی خوای گەورە بوون، وتوویانە: (بریسکانەوەیەکی خۆشویستنی خوای گەورە سەروزیادمانە و ئیتر پێویستمان بە بەهەشت نی‌یە)!

هەر لەم نهێنی‌یەشەوەیە کە فەرموودەیەکی پیرۆز بەم واتایە هاتووە دەفەرموێ: (بینینی جوانیی خوای گەورە لە بەهەشتدا لە سەرووی هەموو چێژەکانی بەهەشتەوەیە).

کەماڵات و تایبەتکاری‌یەکانی ئەم مەحەببەتەش لە رێی: ناوە جوانەکانی خوا و بەدیهاتووانیەوە، لە نێوان بازنەی "تاکی" و "تەنیایی"دا دێنەدی. واتە ئەو شتانەی لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا وەهمی مرۆڤ بە کەماڵیان دادەنێت، هەرگیز "کەماڵ" نین.

○ **هێمای پێنجەم**: پێنج خاڵە:

***خاڵی یەکەم***: نوێنەری گومڕایی دەڵێت: لە فەرموودەکانتاندا لەعنەت لە دنیا کراوە و بە "کەلاك" ناوبراوە. ئەهلی ویلایەت و حەقیقەتیش بە چاوی کەم و سووکایەتی دەڕواننە دنیا و دەڵێن: "دنیا بێ کەڵکە.. چەپەڵە". کەچی تۆ وەها ڕوونی دەکەیتەوە کە مایە و بەڵگەی کەماڵی ئیلاهی‌یە و، وەك شەیدایەك لێی دەدوێیت!!

**وەڵام**: دنیا سێ ڕووی هەیە:

ڕووی یەکەم: دەڕوانێتە ناوە جوانەکانی خوای گەورە و ئاسەوار و نەخش و نیگارەکانی ئەو ناوانە دەردەخات. دنیا - لەم ڕووەیدا - بە واتای حەرفی ئەرکی "ئاوێنە" دەبینێت بۆ ئەو ناوانە. ئەم ڕووەی دنیا: مەکتووبی لەڕادەبەدەری صەمەدانی‌یە، بۆیە شایانی عیشقە، نەك نەفرەت لێکردن. چونکە لەوپەڕی جوانی‌دایە.

ڕووی دووهەم: دەڕوانێتە "ئەودنیا". واتە: ڕوویەکە مەزرای دواڕۆژ و کێڵگەی بەهەشت و شوێنی گوڵ گرتنی میهرەبانیی خوایە. ئەم ڕووەش، وەك هی یەکەم، جوانە و شایانی خۆشویستنە، نەك سووکایەتی پێ کردن.

ڕووی سێهەم: ئەو ڕووەیە کە دەڕوانێتە هەوا و ئارەزووەکانی مرۆڤ و، پەردەی بێ ئاگایان و جێی گاڵتەوگەپ و هەوا و ئارەزووی ئەهلی دنیایە. ئەم ڕووە ڕوویەکی چەپەڵ و ناشیرینە. چونکە فانی و ئازاربەخش و خەڵەتێنەرە.

ئەو سووکایەتی کردنەی کە لە فەرموودە پیرۆزەکەدا بە دنیا کراوە و، نەفرەتی ئەهلی حەقیقەتیش لێی، لەم ڕووەوەیە.

ئەوەش کە قورئانی پیرۆز بە بایەخ پێدانێکی زۆر و گرنگی‌یەوە لە بوونەوەران دواوە، مەبەست دوو ڕووی یەکەمە و هەر ئەم دوانەشن کە هاوەڵە بەڕێزەکان و سەرجەمی ئەولیاکان حەزیان لێ کردووە.

ئنجا دەبێ بزانین کە ئەو کەسانەی بە سووکی دەڕواننە دنیا، چوار بەشن:

**یەکەم:** خواناسانن. ئەوان بۆیە بە چاوی کەم دەڕواننە دنیا (واتە: ڕووی سێ‌هەمی) چونکە ئەم ڕووەی دنیا پەردەیەکە لە بەردەم ناسین و خۆشویستن و پەرستنی خوای گەورەدا.

**دووهەم:** ئاخیرەت خوازانن. ئەمانە یان پێداویستی و سەرقالی‌یەکانی ژیانی دنیا ڕێی کارە قیامەتی‌یەکانیان لێ دەگرێت، یان لە چاو کەماڵات و جوانی‌یەکانی بەهەشتدا، کە بە ئیمانی شهوودی دەیبینن، دنیایان بە ناشیرین بەرچاو دەکەوێت.

بەڵێ، هەروەك ئەگەر پیاوێکی جوان لەگەڵ حەزرەتی یووسفدا - درووودی لەسەر بێت - بەراورد بکرێت، بێ گومان ناشیرین دەردەکەوێت! بە هەمان جۆر، سەرجەمی ئارایشتە بەنرخەکانی دنیاش لە چاو نیعمەتی بەهەشتدا، بێ نرخ دەردەکەون.

**سێ‌هەم:** ئەو کەسەیە کە بە سووکی دەڕوانێتە دنیا چونکە دنیای دەست ناکەوێت! دیارە ئەم سووکایەتی پێ کردنە هی خۆشویستنی دنیایە، نەك نەفرەت لێ کردنی!

**چوارەم:** ئەو کەسەیە کە نەفرەتی لێ دەکات لەبەر ئەوەی دنیای دەست دەکەوێت، بەڵام لە دەستی‌دا نامێنێتەوە و دەڕوات! ئەویش لەتاوا تووڕە دەبێت و هیچ شتێکی دەست ناکەوێت داخی دڵی پێ بڕێژێت، ئەوە نەبێت سووکایەتی بە دنیا بکات و بڵێت: دنیا چەپەڵە! دیارە ئەمەشیان ئەنجامی خۆشویستنی دنیایە!

کەچی سووکایەتی پێ کردنی ڕەوا ئەوەیە کە: ئەنجامی ناسینی خوا و، خۆشویستنی دوارۆژ بێت. بەو واتایەی دووبەشی یەکەم کارەکەیان ڕەوایە.

اللّهم اجعلنا منهم آمين بحرمة سيّد المرسلين ﷺ.

* * *

# هەڵوێستی سێهەم

بِسْمِ اللّٰه الرحمن الرحيم

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ (الإسراء:٤٤)

## ئەم هەڵوێستی سێهەمە بریتی‌یە لە دوو خاڵ، کە لە دوو باسدا پێش چاو دەکەون

## باسی یەکەم

بەپێی ناوەڕۆکی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ هەموو شتێك چەندەها ڕووی زۆری وەك پەنجەرەی هەیە کە دەڕواننە خوای گەورە. چونکە ڕاستی‌یەکانی هەموو بوونەوەران پاڵیان بە "ناوە جوانەکانی خوای گەورە"وە داوە، ئەوەتا حەقیقەتی هەرچی شت هەیە پاڵی بە یەکێك یان گەلێ ناوی خواوە داوە و، ئەو وردەکاری‌یەی کە لەناو هەموو شتێکدا هەیە هی پاڵدانەوەیەتی بە یەکێك لەو ناوانەوە، تەنانەت زانستی "حیکمەت"ی ڕاستەقینە پاڵی بە ناوی جوانی "الحكيم"ی خوای گەورە داوە و، زانستی "پزیشکی"ش پاڵی بە ناوی جوانی "الشافي"یەوە داوە و، زانستی "ئەندازیاری"ش پاڵی بە ناوی جوانی "المُقَدِّر"ی خوای گەورەوە داوە..

بەم جۆرە، هەریەك لە زانستەکان پاڵی بە یەکێك لە ناوە جوانەکانەوە داوە و بەو ناوە کۆتایی دێت، هەروەك ڕاستیی هەموو زانستەکان و، حەقیقەتی کەماڵاتی ئادەمیزاد و، چینەکانی مرۆڤە کامڵەکانیش، هەر هەموویان پاڵیان بە ناوە جوانەکانی خوای گەورەوە داوە، بە ڕادەیەك کە هەندێ لە ئەولیا لێکۆڵەرەکان وتوویانە:

(حەقیقەتی ڕاستەقینەی شتان تەنها ناوە جوانەکانی خوای گەورەن و، ماهییەتی ئەو شتانەش سێبەری ئەو حەقیقەتانەن)!

تەنانەت دەتوانرێت هەرتەنها لە ڕووی ڕواڵەتیی هەموو زیندەوەرێکدا ئاسەواری درەوشانەوەی بیست دانە لەو ناوانە ببینرێت!

وا هەوڵ دەدەین ئەم ڕاستی‌یە ورد و مەزن و یەکجار فراوانە بە نموونەیەك نزیك بخەینەوە، کە ئەو نموونەیەش بە چەند پاڵێوگەیەك بپاڵێوین و بە چەند هۆکارێکی جیاجیای شی

کردنەوەش شیتەڵی بکەینەوە. جا هەرچەندە باسەکە درێژە بکێشێت هەر بە کورت دادەنرێت، دەبێ بێزار نەبین:

ئەگەر هونەرمەندێکی کارامە لە بواری هونەری نیگارکێشان و پەیکەرسازیدا، بیەوێت وێنەی گوڵێکی قەشەنگ بکێشێت و، پەیکەری کیژێکی جوان بتاشێت، ئەوا یەکەم هەنگاوی کارەکەی بە کێشانی چەند هێڵێکی شێوە گشتییەکەی هەردووکیان دەست پێ دەکات..

دیارە ئەم هێڵ کێشانەش بە "ڕێکخستن" و "دەستنیشان کردن"ێکی ئەوتۆیە کە تیایدا پاڵ بە زانستی "ئەندازیاری"یەوە دەدات و، سنوورەکانی ئەو هێڵانە بەپێی ئەو زانستە دەستنیشان دەکات. جا ئەم ڕێکخستن و دەستنیشان کردنە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە بە: "زانایی" و "دانایی" ئەنجام دراون. واتە کاری ڕێکخستن و دەستنیشان کردن بەپێی پەرکاری "زانایی" و "دانایی" ئەنجام دەدرێن. کەواتە واتاکانی زانست و دانست، لە پشت کاری ڕێکخستن و دەستنیشان کردنەوە، حوکم دەکەن. بۆیە یاسا و دەستوورەکانی زانیاری و حیکمەت، دوایی خۆیان دەردەخەن..

بەڵێ ڕاستە، ئەوەتا خۆیان دەرخست، چونکە دەبینین وا هونەرمەندەکە دەستی کرد بە کێشانی وێنەی چاو و لووت و گوێی کیژە جوانەکە و، گەڵا و هێڵە وردەکانی نیگاری گوڵەکە لەناو ئەو سنوورانەدا کە یەکەم جار دەستنیشانی کردن.. ئنجا دەبینین ئەو ئەندامانەی کە بەپێی پەرکاری "زانایی" و "دانایی" دەستنیشان کران، وا ئێستا شێوەی "سنعەت"ێکی ڕێکوپێك و "چاودێری"یەکی وردیان لەخۆ گرت. کەواتە واتاکانی: "سنعەت" و "چاودێری" لە پشت پەرکاری زانایی و داناییەوە حوکم دەکەن و، دوایی خۆیان دەردەخەن..

بەڵێ، توانا و قابیلییەتی: جوانی و ئارایشت، وا وردە وردە دەرکەوتن. دیارە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو شتەی سنعەت و چاودێرییەکەی لەدەستدایە و دەیبینێت و دەیبزوێنێت تەنها: "ویستی جوانکردن" و "نیاز و مەبەستی ئارایشتدان"ە، کە لە پشتی سنعەت و چاودێرییەکەوە حوکم دەکەن..

وا هونەرمەندەکە دەستی کرد بە نەخشاندنی شێوەی زەردەخەنە لە ڕوخساری کیژە جوانەکەدا و، بەخشینی چەند بارودۆخێکی زیندووانەش بە نەخش و نیگاری گوڵە ڕەنگینەکە. واتە هەردوو کاری: "ڕازاندنەوە" و "ڕووناککردن" لەو دوو شاکارەیدا دەست پێ کرد..

کەواتە ئەو شتانەی واتای: ئارایشتدان و ڕووناککردنەوە دەبزوێنن و حوکمیان دەکەن، بریتین لە هەردوو ناوەڕۆکی "لوتف" و "کەرەم". بەڵێ، ئەم دوو واتا و ناوەڕۆکە لە پشت

پەردەی ڕووناك كردنەوە و ئارایشتدانەوە حوكم دەكەن، تەنانەت هێندەش زاڵن كە دەڵێی هەریەك لەو گوڵ و پەیكەرە جوان و ئارایشت دراوە: لوتف و كەرەمێكی بەرجەستەن!

جا ئایا واتاكانی لوتف و كەرەمیش چی دەیانبزوێنێت و لە پشتیانەوە حوكم دەكات جگە لە واتاكانی "خۆناساندن" و "خۆخۆشەویست كردن"؟ واتە: ناساندنی خۆی بە خەڵكی و خۆشەویست كردنی لای ئەوان، لە ڕێی كارامەیی و هونەرەكەیەوە؟..

ئنجا ئەم خۆناساندن و خۆ خۆشەویست كردنەش، وەك ئاشكرایە، لە مەیلی "میهرەبانی" و ویستی "نیعمەت"ەوە هاتوون. جا مادەم مەیلی میهرەبانی و ویستی نیعمەت لە پشتی ئەم خۆناساندن و خۆ خۆشەویست كردنەوەن، ئەوا هەموو لایەكی ئەو پەیكەرە لە جۆرەهای ئارایشت و نیعمەت پڕ دەكەن و بەسەر وێنەی گوڵە جوانەكەشدا دیاریی بەنرخ هەڵدەواسن.. ئەوەتا دەبینین هونەرمەندەكە ناودەست و سەرسنگی پەیكەرەكەی لە چەندین نیعمەتی بەنرخ پڕ كرد و چەندەها مرواریی گرانبەهاشی بەسەر نەخش و نیگاری گوڵەكەدا هەڵواسی. بەو واتایەی كە هەموو ناوەرۆكەكانی بەزەیی و سۆز و میهرەبانی، مەیلی ڕەحمەت و ویستی نیعمەتیان لای ئەو بزواند..

ئەی ئایا چی ناوەرۆك و واتاكانی ئەم سۆز و بەزەیی و میهرەبانی‌یە دەبزوێنێت و دەیانخاتە ڕوو لای ئەم هونەرمەندەی كە پێویستی بە كەس نی‌یە، جگە لەو "جوانی" و "كەماڵ"ە مەعنەوی‌یانەی كە لە زاتی خۆیدان و دەیانەوێت دەربكەون؟ چونكە قەشەنگترینی ئەو شتانەی كە لەو جوانی‌یەدان بریتی‌یە لە "خۆشەویستی" و، بەلەزەت‌ترین شتیش تیایدا بریتی‌یە لە "میهرەبانی". جا هەریەك لەم دوانە (واتە: خۆشەویستی و میهرەبانی) دەیانەوێت لە ئاوێنەی سنعەتدا خۆیان پیشان بدەن و بە چاوی موشتاقانیش خۆیان ببینن. چونكە هەریەك لە "جوانی" و "كەماڵ" لە زاتی خۆیدا خۆی لە هەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێت، لەو ڕووەوە كە لە یەك كاتدا جوانیشە و خۆشەویستیشە! كەواتە یەكگرتنی عیشق و جوانی لەم خاڵەوە هاتووە. خۆ مادەم "جوانی" خودی خۆی خۆش دەوێت، ئەوا دەیەوێت خۆی لەناو ئاوێنەكاندا ببینێت.

جا ئەو نیعمەتانەی كە لەسەر سنگ و ناو دەستی ئەو پەیكەرەدا دانراون و ئەو بەرهەمە ناسك و ڕەنگینانەش كە بەسەر نیگاری گوڵەكەدا هەڵواسراون، هەریەكەیان بەپێی توانا و قابیلییەتی خۆیان، بریسكەیەكی ورشەداری ئەو جوانی‌یە مەعنەوی‌یەیان پێ‌یە كە چ بۆ خاوەن جوانی‌یەكە و چ بۆ كەسانی تریان دەردەخەن و پیشانیان دەدەن.

كردگاری داناش (ولله المثل الأعلى) بە وێنەی ئەم نموونەیە:

بەهەشت و، دنیا و، ئاسمانەکان و، زەوی و، ڕووەك و، زیندەوەران و، جینني و، ئادەمیزاد و، مەلائیکەت و، ڕۆحانییات.. بە واتایەکی کورت و پوخت تر: هەموو شتێکی کوللی و جوزئی، بە درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خۆی ڕێك دەخات و، هەریەکەیان ئەندازەیەکی دەستنیشان کراوی پێ دەدات، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە ناوی: "المقدِّر، المنظِّم، المُصَوِّر"یان لەسەر دەخوێنرێتەوە.

جا بەم دەستنیشان کردنە وردەی شێوەی گشتیی هەموو شتێك لە لایەن خوای گەورەوە، ئەو شتە ناوی: "العليم، الحكيم" دەردەخات.

پاشان لەناو سنوورە دەستنیشان کراوەکاندا و بە ڕاستەی زانست و پەرکاری دانست، وێنەی ئەو شتە هێندە بە ڕێکی و وردی دەکێشێت کە واتاکانی: سنعەت و چاودێری، واتە دوو ناوی: "الصانع، الكريم" دەردەخات..

ئنجا بە فلّچەی: "چاودێری" و دەستی بە کەرەمی "سنعەت" جوانی و ئارایشت لەسەر ڕوخساری ئەو وێنەیەدا دەکێشێت، جا ئەگەر ئەو وێنەیەی کە دەیکێشێت "مرۆڤ" بێت چەندەها جۆری ئارایشت و جوانی بە ئەندامەکانی چەشنی چاو و لووت و گوێی دەبەخشێت.. ئەگەر "گوڵ" بێت گەلێ جۆری جوانی و ئارایشت و پاراوی بە گەڵا و لق و تاڵە نەرم و باریك و ناسکەکانی دەدات.. گەر وێنەکە "زەوی" بێت ئەوا چەندین ڕەنگی ئارایشت و جۆری قەشەنگی و جوانی بە کانزا و ڕووەك و زیندەوەرەکانی دەبەخشێت.. خۆ ئەگەر ئەو وێنەیە "بەهەشتی بەرین" بێت ئەوا چەندەها جۆری جوانی بە کۆشك و تەلارەکانی و گەلێ ڕەنگی "ئارایشت و قەشەنگی" بەسەر حۆرییەکانیدا دەبارێنێت... هتد..

پاشان بە شێوازێکی ناوازەی "ئارایشت" و "ڕووناکی" ئەو شتە دەڕازێنێتەوە و، ڕوونی دەکاتەوە. بە ڕادەیەك کە واتاکانی "لوتف" و "کەرەم" حوکمی دەکەن و، ئەو بەدیهاتووە ڕازاوە و ڕووناکە دەکەن بە: لوتف و کەرەمێکی بەرجەستەی ئەوتۆ کە هەردوو ناوی: "اللطيف، الكريم" یاد دەخەنەوە..

ئەو شتەش کە هانی لوتف و کەرەم دەدات بەم جۆرە خۆیان دەربخەن، بریتییە لە: "خۆناساندن" و "خۆ خۆشەویست کردن" واتە: خۆشەویست کردنی زاتی مەزنی خۆی لای زیندەوەران و خۆناساندنی بە خاوەن هەستان، کە ئەمەش لە ڕادەیەکی ئەوتۆدایە هەردوو ناوی "الودود، المعروف" - کە لە پشت هەردوو ناوی "اللطيف، الكريم"ەوەن - بەسەر ئەو شتەوە بە ڕوونی دەخوێنرێنەوە، تەنانەت خوێندنەوەی ئەو دوو ناوە لە زمانی حاڵی خودی ئەو بەدیهاتووەشەوە دەبیسترێت و بەر گوێ دەکەوێت.

پاشان خوای گەورە، ئەو بەدیهاتووە جوان و ئارایشتدراوەی خۆی بە چەندین بەروبوومی بەلەزەت و ئەنجامی حەزلێکراو دەڕازێنێتەوە و، ئارایشتەکە دەگۆڕێت بە "نیعمەت" و جوانی و قەشەنگی‌یەکەش دەگۆڕێت بە "میهرەبانی"، ئەمەش لە ڕادەیەکی وەهادایە کە هەر کەسێك دەیانبینێت یەکسەر لە ژێر پەردە ڕواڵەتی‌یەکانەوە هەردوو ناوی: "المنعم، الرحيم" دەخوێنێتەوە و دەیانبینێت.

پاشان ئەو شتەی دوو ناوی: "الرحيم، الكريم" - کە خاوەنەکەیان هەرگیزاو هەرگیز پێویستی بە هیچ شتێك نی‌یە - دەخاتە ڕوو، تەنها کاروباری "سۆز و بەزەیی‌هاتنەوە"یە. ئەمەش وا لە بینەر دەکات کە هەردوو ناوی: "الحنان، الرحمن" بەسەر ئەو سنعەتەوە بخوێنێتەوە.

ئەوەش کە واتاکانی: سۆز و بەزەیی‌هاتنەوە دەخاتە ڕوو، "جوانی" و "کەماڵ"ێکی زانستیی وەهان کە دەیانەوێت دەربکەون و ئاشکرا ببن. ئەمەش وا لە بینەر دەکات ناوی: "الجميل" هەروەها دوو ناوی: "الودود، الرحيم" کە لە ناوی "الجميل"دان، بەسەر ئەو شتەوە بخوێنێتەوە. چونکە "جوانی" لە خۆیدا خۆشەویستە و خاوەنی جوانییش زاتی خۆی خۆش دەوێت. لەبەر ئەوەی کە لە یەك کاتدا: "جوانی"یش و "مەحەببەت"یشە! بە هەمان جۆر، خاوەنی کەماڵیش زاتی خۆی خۆش دەوێت، واتە: بێ هیچ هۆکارێك خۆش ویستراوە. کەواتە لە یەك کاتدا ئەو کەماڵە: خۆشەویست و خۆش ویستراویشە!

جا مادەم "جوانی"یەك کە لە کەماڵێکی بێ‌سنووردایە و، "کەماڵ"ێکیش کە لە جوانی‌یەکی نەبڕاوەدایە، بەوپەڕی خۆشەویستی یەکتریان خۆش دەوێت و شایانی عیشق و مەحەببەتن، ئەوا بێ هیچ گومانێك دەیانەوێت لە چەندان ئاوێنەدا دەربکەون و، بەپێی توانا و لێهاتنی ئاوێنەکان بریسکانەوە و درەوشانەوەی خۆیان ببینن و پیشانی کەسانی تریشی بدەن.

لەمانەوە دەردەکەوێت کە:

"جوانی" و "کەماڵ"ی زاتیی: کردگاری شکۆمەند و، حەکیمی خاوەن جوانی و، بەتوانای خاوەن کەماڵ، دەیانەوێت سۆز و بەزەیی‌یان بخەنە کار، بۆیە دوو ناوی: "الرحمن، الحنان" دەخەنە ڕوو.. ئنجا "سۆز" و "بەزەیی‌هاتنەوەش" بە دەرخستنی: میهرەبانی و نیعمەت، هەردوو ناوی: "الرحيم، المنعم" ئاشکرا دەکەن.. میهرەبانی و نیعمەتیش داخوازی: کاری خۆناساندن و خۆ خۆشەویست کردنن و، کارێك دەکەن کە هەردوو ناوی: "الودود، المعروف" بەسەر بەدیهاتووەکەوە دەربکەون.. ئنجا ئەم خۆناساندن و خۆ خۆشەویست کردنەش واتای لوتف و کەرەم دەبزوێنن و هەردوو ناوی: "اللطيف، الكريم" لە

هەندێ لایەنی بەدیهاتووەکەدا بە چەشنێك دەردەخەن کە بە جوانی دەخوێنرێنەوە.. ئنجا کاروباری لوتف و کەرەمیش هەردوو کاری: "ئارایشتدان" و "ڕووناك کردنەوە" بە ڕادەیەك دەجووڵێنن کە بە زمانی حاڵی جوانی و ڕووناکیی بەدیهاتووەکە، دوو ناوی: "المزيِّن، المنوِّر" بەسەر ئەو شتەوە بخوێنرێنەوە.. ئنجا ئیشوکاری جوانکردن و ئارایشتدانیش، داخوازی واتاکانی: "سنعەت" و "چاودێری"ن و دووناوی: "الصانع، المحسن" وا بەرجەستە دەکەن کە لەسەر ڕوخساری جوانیی ئەو بەدیهاتووەدا بخوێنرێتەوە.. ئەو سنعەت و چاودێرییەش داخوازی "زانین" و "دانست"ێکی ئەوتۆن کە ناوی: "العليم، الحكيم" لەسەر ئەندامە بە حیکمەت ڕێکخراوەکانی ئەو بەدیهاتووە بخوێنرێنەوە.. بێ گومان ئەو زانین و دانستەش داخوازی کاری "ڕێکخستن" و "شکڵ و شێوە کێشان"ن، کەواتە ئەو بەدیهاتووە دوو ناوی: "المُصوِّر، المُقَدِّر" لە شکڵ و شێوەی خۆیدا بە چەشنێك پێش چاو دەخات کە بە ئاشکرا بخوێنرێنەوە.

کردگاری مەزن هەموو سنعەتەکانی خۆی بەم جۆرە بەدی دەهێنێت. بە ڕادەیەك کە زۆربەی بەدیهاتووەکانی، بە تایبەت زیندەوەران، گەلێ "ناوی جوانی گەورە" دەخەنە پێش چاوی خاوەن هەستان تاکو بیانخوێننەوە. دەڵێیت خوای گەورە بیست دەست بەرگ و پۆشاکی جیاجیا و تێهەڵکێشی کردووەتە بەر هەموو سنعەتێکی خۆی.. یان دەڵێی خوای گەورە ئەو سنعەتەی بە بیست پەردە و پۆشاك داپۆشیوە و، ئنجا ناوە جوانەکانی خۆی لەسەر هەموو بەرگ و پۆشاك و پەردەیەك نەخشاندووە!

بۆ نموونە: هەر لە بەدیهاتنی ڕواڵەتیی گوڵێکی ناسك یان کیژێکی جواندا - بە وێنەی نموونەکە - گەلێ "لاپەڕە"ی زۆری ئەو ناوانە دەبینیت. دەتوانیت ئەم دوانە بکەیت بە نموونە تاکو بەدیهاتووە مەزنەکانی تریان لەسەر قیاس بکەیت:

*لاپەڕەی یەکەم:* بریتییە لە شکڵی ئەو شتە، کە ئەندازە و شێوە گشتییەکەی دەستنیشان دەکات و، ناوەکانی: "يا مصور، يا مقدر، يا منظم" یاد دەخاتەوە.

*لاپەڕەی دووهەم:* وێنەی ئەندامە جیاجیاکانە، کە لە ناوەندی ئەو شکڵە سادەکارەی گوڵ و مرۆڤەکەدا دەردەکەون و، گەلێ ناوی وەك: "العليم، الحكيم" لەو لاپەڕەیەدا تۆمار دەکەن.

*لاپەڕەی سێهەم:* بەخشینی جوانی و ئارایشتی جۆراوجۆرە بە ئەندامە جیاجیاکانی ئەو دوو بەدیهاتووە، بە ڕادەیەك کە لەو لاپەڕەیەدا گەلێ ناوی وەك: "الصانع، البارئ" دەنووسن.

*لاپەڕەی چوارەم*: ئەو جوانی و ئارایشتە ناوازەیەیە کە بەو دوو بەدیهاتووە بەخشراون و لە ڕادەیەکی وەهادان دەڵێی لوتف و کەرەمیان تێدا بەرجەستە بووە! جا ئەم لاپەڕەیە گەلێ ناوی زۆری وەك "یا لطیف، یا کریم" یاد دەخەنەوە و لە سەریان دەخوێنرێنەوە.

*لاپەڕەی پێنجەم*: هەڵواسینی گەلێ بەروبوومی بەلەزەتە بەو گوڵەدا و، بەخشینی ئەولادی خۆشەویست و ڕەوشت و ئاکاری بەرز و جوانە بەو کیژە قەشەنگە، کە ئەمەش لە ڕادەیەکی وەهادایە گەلێ ناوی وەك: "یا ودود، یا رحیم، یا منعم" بەسەر ئەو لاپەڕەیەوە دەخوێنرێنەوە.

*لاپەڕەی شەشەم*: نیعمەت بەخشین و چاکەکاریێە، کە ناوەکانی وەك: "یا رحمن، یا حنان"یان لەسەر دەخوێنرێتەوە.

*لاپەڕەی حەوتەم*: دەرکەوتنی چەند بریسکانەوەیەکی ئاشکرای جوانییە لەو نیعمەت و ئەنجامانەدا، بە ڕادەیەك کە شایستەی سوپاسێکی بێ گەردی وەهایە بە تاسە و شەفەقەتی ڕاستەقینە شێلرابێت و شایانی مەحەبەتێکی بێ گەرد و خاوێن بێت. بۆیە ئەم لاپەڕەیە ناوەکانی: "یا جمیل ذا الکمال، یا کامل ذا الجمال" دەنووسێت و دەخوێنێتەوە.

بەڵێ، ئەگەر تەنها یەك دانە گوڵی ناسکۆڵە و کیژێکی جوان، هەر تەنها لە شێوە ڕواڵەتییە ماددییەکەیاندا، تا ئەم ڕادەیە ناوە جوانەکانی خوا دەربخەن، دەبێ سەرانسەری گوڵەکان و، سەرجەمی زیندەوەران و، بوونەوەرە مەزنە هەمەکییەکان، تا چ ڕادەیەك ناوە جوانەکانی خوای گەورە بەرجەستە بکەن و پێش چاویان بخەن؟! بۆ خۆت ئەمە لێك بدەرەوە.

دەتوانیت لەبەر ڕووناکیی ئەمەدا بزانیت کە "مرۆڤ" لە هەموو لاپەڕەکانی ژیان و سەرجەم لایەنە ناسکەکانی وەك: "گیان "و "دڵ" و "ژیری"دا تا چ ڕادەیەك ناوە جوانەکانی چەشنی: "الحي، القیوم، المحيي" دەخوێنێتەوە و لە خۆیشیدا بەرجەستەیان دەکات!

بەم جۆرە: بەهەشت و، حۆری و، گۆی زەوی و، بەهار، هەریەکەیان لە شوێنی خۆیاندا، گوڵێکن و.. ئاسمانیش گوڵێکە، حەوت ڕەنگەکانی ڕووناکییەکەشی "ڕەنگ و بۆیە"ی کێشانی نەخش و نیگارەکانی ئەو گوڵەن!

جیهانیش مرۆڤێکی جوانی گەورەیە، هەروەك مرۆڤیش جیهانێکی پوختی بچووك کراوەیە. کەواتە هەریەك لە: حۆری و، کۆمەڵی ڕۆحانییات و، ڕەگەزی مەلائیکەت و، پەری جینئی و، جۆری مرۆڤ، لە حوکمی ئادەمیزادێکی جواندا بەدی هێنراون و ڕێك خراون و شێوەیان کێشراوە. هەروەك هەریەکەیان چەند ئاوێنەیەکی جۆراوجۆری جیاجیان بۆ دەرخستنی: (جوانی و، کەماڵ و، میهرەبانی و، مەحەبەتی

خوای گەورە) و، هەر یەکەشیان شایەتێکی ڕاستن لەسەر جوانی و کەماڵ و میهرەبانی و مەحەبەتێکی نەبڕاوە و، نیشانە و بەڵگەی ئەو جوانی و کەماڵ و میهرەبانی و مەحەبەتەن.

جا ئەم هەموو جۆرە کەمالاتە بێ کۆتاییانە، لەناو بازنەی "تاکی" و "تەنیایی"دان. بەو واتایەی کە هەر شتێك لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا وەهمی مرۆڤ بە "کەماڵ"ی دادەنێت، هەرگیزاو هەرگیز کەماڵ نی‌یە!

لەمەوە تێبگە کە بۆچی:

"حەقیقەت"ی هەموو شتێك پاڵی بە ناوە جوانەکانەوە داوە، تەنانەت "حەقیقەتە ڕاستەقینەکان" تەنها بریتین لە: دەرکەوتن و درەوشانەوەی ئەو ناوانە. ئەوەش بزانە کە هەرچی شت هەیە، بە چەندین ڕوو و بە گەلێ زمانی زۆر و زەبەندە، سەرگەرمی ناوبردن و زیکر و تەسبیح و تەقدیسی بەدیهێنەرەکەیەتی و، لەمەشەوە بۆ خۆت لە تەنها یەك واتای نێوان واتا زۆرەکانی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وإنْ مِن شَيءٍ إلاّ يسبّح بِحَمدِهِ﴾ تێبگە و بڵێ: "سُبْحانَ مَن اختفى بشِدَّة ظهُوره"!

هەروەها لە نهێنی‌یەکی کۆتایی ئایەتەکان و، حیکمەتێکی دووپات کردنەوەی هاوچەشنی: (وَهُوَ العليمُ القدير)، (وَهوَ الغَفورُ الرّحيم)، (وَهُو العَزيزُ الحَكيم) تێبگە.

خۆ ئەگەر نەتوانیت لە یەك دانە گوڵدا ناوە جوانەکان بخوێنیتەوە و بە ئاشکرا بیانبینیت، ئەوا سەیری بەهەشت بکە و، بیر لە بەهار بکەرەوە و، ڕووی زەوی ببینە. ئەو کاتە دەتوانیت بە ئاشکرا ئەو ناوانە بخوێنیتەوە کە بەسەر بەهەشت و، بەهار و، ڕووی زەوی‌یەوە نووسراون، کە هەریەکەیان گوڵێکی یەکجار گەورەی میهرەبانی فراوانی خوای گەورەن.

# باسی دووهەم

نوێنەر و بانگەوازکاری "گومڕایی" کاتێ هیچ شتێکی دەست ناکەوێت گومڕایی‌یەکەی لەسەر بنیات بنێت و، قسەی نامێنێت و، بەڵگە دەیبەستێتەوە، دەڵێت :

من بەختەوەریی دنیا و، تام چەشتنی ژیان و، بەرزی و، شارستانێتیی و، پێشکەوتنی پیشەسازی لەوەدا دەبینم کە: یادی دوارۆژ نەکەمەوە و، باوەڕم بە خوا نەبێت و، دنیام خۆش بوێت و، لە هەموو جۆرە خۆبەستنەوەیەك سەربەست بم و، شانازی بە خۆمەوە بکەم و، لە خۆم ڕازی بم.. لەبەر ئەوە، تا ئێستا و لەمەولایش زۆربەی خەڵکم - بە هیممەتی شەیتان - بەرەو ئەم ڕێیە داوەتەبەر.

**وەڵام:** ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە، بە ناوی قورئانی پیرۆزەوە دەڵێین:

ئەی مرۆڤی بێچارەی بەدبەخت! بۆ لای ژیریت بگەڕێرەوە! گوێ بۆ جاڕدەری گومڕایان ڕامەگـرە، چونکە گـەر گوێی لـێ ڕاگریت، ئەوەندە زیان دەكـەیت كـە دڵ و گیـان و ژیـری لە تەسەوور كردنیشی‌دا لەرزەیان بە جەستەدا دێت.

تۆ تەنها دوو ڕێگات لە بەردەمدایە:

یەكەم: ڕێیەكی پڕ لە دەردی‌سەری‌یە و، بانگەوازكاری گومڕایی پیشانتی دەدات.

دووهەم: ڕێی بەختەوەری‌یە، كە قورئانی پیرۆز ڕوونی دەكاتەوە بۆت.

لە بەشـێكی زۆری "وتـەكان" بـە تایبـەتی لـە "وتـە بچووكـەكان"دا گەلـێ بـەراوردت لـە نێوان ئەو دوو ڕێ‌یەدا بینی، ئێستاش لەبەر گونجاویی ئەم باسە، فەرموو بیرێك لە تەنها یەك لـە هەزاری ئەو بەراوردكاری‌یانە بكەرەوە، كە ئەمەی خوارەوەیە:

ڕێی: شـیرك و گومڕایـی و هـەرزەیی و خراپكـاری، مرۆڤ دەهاوێتـە نزمـترین نزمـی و لـە ناوەندی ئازارە لەژمارەبەدەرەكانی‌دا كۆڵێكی گەلـێ قورسیش دەخاتە سەر ئەستۆی لاوازی بێ‌دەستەڵاتیەوە، چونكە ئەگەر مرۆڤ خوای گـەورە نەناسێت و پشتی پێ نەبەستێت، وەك ئاژەڵێكی فانیی لـێ دێت، هەمیشە لە خەم و ئـازار و پـەژارەدا دەبێـت و، لـەناو كۆڵـەواری و لاوازی‌یـەكی بێ كۆتـایی و، هـەژاری و موحتاجی‌یـەكی نـەبڕاوەدا دەتلێتـەوە و، دووچـاری چەندین گیروگرفتی بێ سنوور دەبێت و، هەردەم بە ئازاری: جودایی ئەو كەس و شتانەی كە خۆشی ویستوون و پەیوەندی لەگەڵیاندا بەستووە، دەتلێتەوە. ئیتر بە هەمیشەیی و بـەردەوامی ئەم ئازارە دەچێژێت، تا لە ئەنجامدا خۆیشی ماڵئاوایی لە پاشماوەی خۆشەویستانی دەكات و، بە خەم و پەژارە و تەنیا و ئاوارەیی بەجێ‌یان دەهێڵێت و بەرەو تاریكیی گۆڕ دەكەوێتە ڕێ.

ئنجـا هـەرچەندەش كە جگـە لـە ویسـتێكی جوزئـی و، تـوانایـەكی كـەم و، ژیـانێكی كورت و، بیرێكی كزی كوژاوە و، تەمەنێكی لەناوچوو هیچی تر شك نابات، كەچی لەگەڵ ئەوەشـدا، بـە درێژایی تەمـەنی، خـۆی لـە بـەردەم چـەندەها ئـاوات و ئـازاری بێ كۆتـایی و لـەژمارەبەدەردا دەبینێتەوە و، هەر هەوڵێكیش بۆ ئارامكردنەوە و چارەسـەری‌یان و هێنانـەدیی ئارەزووەكانی بدات، هەمووی بە فیڕۆ دەڕوات.. بەم پێ‌یە ئەم مرۆڤە، بێ ئەوەی هیـچ بـەرێك لە درەختی ژیانی بچنێت، ژیانی تەواو دەبێت و ماڵئاوایی لە دنیاكەی دەكات.

ئەم مرۆڤە لە كاتێكدا كە ئەركەكانی خۆی پێ هەڵناگیرێت، دەچێـت كۆڵـە قورسـەكانی دنیاش دەخاتە ئەستۆی بێ هێز و لاوازی خۆیەوە! كەواتە پێش ئەوەی بگاتـە دۆزەخ، هـەر لـە دنیادا بەدەست ئەشكەنجەیەكی سووتێنەری دۆزەخ ئاساوە دەسووتێت و ئازار دەچێژێت.

گومڕایان، لەبەر ئەوەی خۆیان دەخەنە باوەشی بێئاگایی، تاکو بەو مەستی‌یەی لە بێئاگایی‌دایە هەستەکانیان بە چەشنێکی کاتی لەکار بخەن و بەنجیان بکەن، ئەوا ڕاستەوخۆ هەست بەم ئازارە سەخت و گیانی‌یە سامناکە ناکەن. بەڵام هەر ئەوەندەی یەکێکیان لە لێواری گۆڕەکەی نزیك دەبێتەوە، یەکسەر هەستی ناسك دەبێت و بە چەندین قات – لە یەك کاتدا – هەست بەو هەموو ئازارانە دەکات.

چونکە ئەگەر خۆی بە بەندەی خوای گەورە نەزانێت، ئەوا پێی وا دەبێت کە خۆی خاوەنی خۆیەتی، کەچی دەبینێت لەگەڵ ئەو ویستە جوزئی و توانا بچووکەش کە هەیەتی ئەوەندە کۆڵەوار و دەستەپاچەیە لە بەردەم حاڵەتە سەختەکانی دنیادا کە تەنانەت خۆیشی بۆ بەڕێوەناچێت، چونکە دەبینێت جیهانی دەوروبەری هەر لە بچووکترین میکرۆبەوە تا دەگاتە بوومەلەرزە ڕووخێنەرەکان، هەموویان دوژمنایەتیی دەکەن و هەردەم ئامادەن پەلاماری بدەن و کۆتایی بە ژیانی بهێنن. ئیتر هەرکات گۆڕی بە ئەندێشەدا بێت و ببینێت، یەکسەر ترسی لێ دەنیشێت و هەموو جەستە و دڵ و دەروونی بە جارێ لەرز دایدەگرێت!

ئەم مرۆڤە هەروەك بەم دەردەیەوە دەتلێتەوە، حاڵەتەکانی دنیاش کە ئەم پابەندیانە و ئەو کەسانەش پەیوەندیی لەگەڵیاندا هەیە، هەردەم ماندوویی بۆ فەراهەم دەهێنن، چونکە گومانی وایە ئەو ڕووداوانە ئەنجامی گاڵتە و یاریی "سروشت" و "ڕێکەوت"ن و، کاری یەکێکی تاك و تەنیای دانا و زانا و، تەقدیری بەتوانایەکی میهرەبان و بەخشندە نین. ئیتر بەم جۆرە، لەگەڵ ئازارەکانی خۆیدا، ئازاری خەڵکیش دەچێژێت و، بوومەلەرزە و، تاعوون و، لافاو و، قاتی و، گرانی و، نەمان و، لەناوچوون و هاوچەشنیان، لە بیری ئەمدا دەبن بە بەڵای ئازاربەخش و چەند گێروگرفتێکی ڕەش و تاریك.

جا ئەم مرۆڤەی کە ئەم بارە ناسۆرەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، بەزەیی هیچ کەسێك نابزوێنێت، چونکە ئەم لەم چەشنە بارودۆخەی‌دا وەك ئەو کەسە وایە کە لە بەراوردی نێوان دوو براکەی وتەی "هەشتەم"دا باس کراوە کە: پیاوێك بە چێژی لەزەتێکی خاوێن و، کەیف و شادی‌یەکی شیرین و بەنرخ و حەڵاڵ، لە نێوان خۆشەویستە باشەکانی و لەناو باخچەیەکی دڵڕفێن و میوانداری‌یەکی بەڕێزدا، ڕازی نەبوو.. پاشان بۆ ئەوەی لەزەتێکی ناڕەوای دەست بکەوێت، دەستی‌دایە خواردنەوەی مەی و شەرابی چەپەڵ تا وای لێ هات مەست بوو، ئنجا بە خەیاڵ لای وابوو کە لە شوێنێکی پیس و لە نێوان چەندین ئاژەڵی دڕندە و خوێنمژدایە و، وەك لە چلەی زستاندا بێت ئاوا لەرزی لێ دەهات و لەتاودا هاواری دەکرد..

بەڵام هیچ کەسێك بەزەیی پێدا نەهاتەوە، چونکە هاوەڵە باشەکانی خۆی بە ئاژەڵی دڕندە دادەنا و بە سووکی ناوی دەهێنان و، لای وابوو خواردەمەنی‌یە خۆش و قاپە خاوێنەکانی هۆڵی میوانداری‌یەکەش بەردی پیس و چڵکنن، لەبەر ئەوە دەستی بە شکاندنیان کرد و، گومانی وابوو کە کتێب و نامە بەنرخەکانی ناوکۆڕەکەش، چەند نەخشونیگارێکی ئاسایی و بێ نرخن و، لەبەر ئەم گومانەی هەموویانی دڕی و پێ‌شێلی کردن و خستنیە بەرپێی خەڵکەوە و.. بۆ خۆی لەم چەشنە ڕەفتارانەدا بەردەوام بوو..

جا هەروەك ئەم مرۆڤە و هاوچەشنی شایانی بەزەیی نین، بەڵکو دەبێ تەمێ و سەرزەنشت بکرێن، ئەو کەسەش بە هەمان جۆرە کە بەهۆی ئەوەی مەستیی کوفر و شێتیی گومڕایی هەڵبژاردووە، لای وایە:

ئەم دنیایە، کە میوانخانەی بەدیهێنەری زانایە، یاری و گاڵتەی ڕێکەوتی کتوکوێر و سروشتی کەڕوکاسە و.. نوێ بوونەوەی بەدیهێنراوانیش، کە درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە نوێ دەکەنەوە و لەگەڵ تەوژم و لافاوی "کات"دا بەرەو جیهانی غەیب دەڕۆن، دوای ئەوەی ئەرکی سەرشانیان بەجێ هێنا و کاریان تەواوبوو، ئەو مرۆڤە لای وایە ئەوانە دەڕژێنە دەریای نەبوون و شیوی لەناوادان و لە لێواری دەریای لەناوچووندا بە یەکجارەکی ئاوا دەبن و.. دەنگەکانی تەسبیحات و ستایش کردنی خواوەند کە هەموو جیهان و بوونەوەرانیان پڕ کردووە، ئەو بە خەیاڵی خۆی پێی وایە شیوەنی گریانی شتە فانی و لەناوچووەکانە کە لەتاو جودایی هەمیشەیی دەری دەبڕن و.. لاپەڕەی ئەم بوونەوەرانەش، کە چەندەها نامەی صەمەدانیی خواوەندن، ئەو بە چەند شتێکی تێکەڵوپێکەڵی بێ کەڵك و بێ ناوەرۆکیان دەزانێت و.. دەرگای گۆڕیش، کە ڕێی جیهانی فراوانی میهرەبانی دەکاتەوە، بە تونێلێکی دەزانێت کە سەری لە تاریکستانی نەبوونەوە دەردەچێت.. ئەجەلیش کە بانگەوازی بەیەك‌گەیشتنەوەیە لەگەڵ خۆشەویستە ڕاستەقینەکاندا، ئەم بە کاتی جودایی و دابڕانی لە هەموو خۆشەویستانی دادەنێت.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە لە گێژاوی ئەم چەشنە بۆچوون و وەهم و خەیاڵانەدا بژی، خۆی دەهاوێتە ناوەندی ئازارێکی سەختی دنیایی‌یەوە! ئەوەتا سەرەڕای ئەوەی کە شایانی هیچ بەزەیی‌یەك نابێت، شایستەی ئازار و ئەشکەنجەیەکی یەکجار سەختیش دەبێت، چونکە مادەم بوونەوەرانی بە بێ‌مەبەست داناوە، ئەوا نرخ و بەهای شایانی خۆیانی پێ نەداون و ناوە جوانەکانی خوایشی بە ساختە لە قەڵەم داوە، لەبەر ئەوەی ئینکاریی درەوشانەوە ئاشکراکانی ئەو ناوانەی لە بوونەوەراندا و، ئینکاریی نامە پەروەردگاری‌یەکانیشی کردووە، بەوەی کە گوێی خۆی لە ئاستی ئەو نامانەدا کەڕ کردووە کە شایەتی لەسەر یەکتایی خوای گەورە دەدەن.

دەسا ئەی گومڕا نەفامەکان! بەدبەختینە!

ئایا مەزنترین زانست و بڵندترین کۆشکی شارستانی و بەرزترین پلەکانی هەڵکەوتن و بلیمەتی و کارامەترین نەخشەکانی فرۆفێڵتان بەرامبەر بەم نزمبوونەوە و داکەوتنە ترسناکەی مرۆڤ چ سوودێك دەگەیەنن؟ ئایا هەموو ئەو شتانەتان دەتوانن لە بەرامبەر ئەم نائومێدی‌یە ڕووخێنەرەی گیانی مرۆڤەوە (ئەو گیانەی کە تاسەمەندی دڵنەوایی‌یە) خۆیان ڕابگرن؟ ئایا ئەو شتەی کە ناوی: "سروشت"ی لێ دەنێن و، ئەو "هۆکارانە"ی کە شوێنەوارەکانی توانستی خوایان دەدەنەپاڵ و، ئەو "هاوبەش"ەی کە بەخشایشەکانی پەروەردگار بە هی ئەو دەزانن و، ئەو دۆزینەوە نوێیانەی پێوەیان دەنازن و، ئەو "نەتەوە"یەی کە شانازیی پێوە دەکەن و، ئەو "پەرستراوە" ناڕەوایەی دەیپەرستن.. ئایا هەموو ئەمانە دەتوانن لە تاریکیی ئەو مردنە ڕزگارتان بکەن کە ئێوە بە لەناودانی هەمیشەیی تێ‌دەگەن؟ ئایا ئەوانە دەتوانن لە لێواری گۆڕ و سنووری بەرزەخ و مەیدانی حەشردا بە سەلامەتی و دڵنیایی بتانپەڕێننەوە و، یارمەتیتان بدەن تا بتوانن دانایانە بەسەر پردی "سیرات"دا بڕۆن و بتانکەن بە شایانی بەختەوەریی هەمیشەیی و ژیانی نەمری؟

خۆ ئێوە، بێ چەند و چۆن، بەم ڕێیەدا گوزەر دەکەن! چونکە ناتوانن دەرگای گۆڕ لە ڕووی کەسدا دابخەن. کەواتە بتانەوێت و نەتانەوێت ڕێبواری ئەم ڕێگایەن. ئەو کەسەش ئەم ڕێیە دەبڕێت دەبێ پشت بە یەکێك ببەستێت کە شارەزایی‌یەکی تەواوی لە هەموو لاڕێ و تووله ڕێیەك و هەموو سنوورێکی ئەو ڕێیەدا بیێت، تەنانەت دەبێ هەموو ئەو فەرمانگە مەزنانەشی لە ژێر فەرمان و دەستەڵاتدا بن.

ئەی گومڕایانی بێ‌ئاگا!

بەدیهێنەری مەزن لەبەر ئەوە لە سروشتی ئێوەدا ئامادەیی و لێهاتن و تواناکانی: "خۆشەویستی" و "ناسین" و، هۆکارەکانی "شوکرانەبژێری" و "پەرستن"ی داناوە تاکو بۆ زاتی خوای گەورە بەکاربهێنرێن و ڕوویان لە سیفەتە مەزن و ناوە خاوێن و جوانەکانی ئەو بێت. کەچی ئێوە هەموو ئەمانەتان، بە جۆرێکی ناڕەوا، بۆ (خۆتان و دنیاکەتان) بەکار هێناوە. وا ئێستاش بەپێی دەستووری: "ئەنجامی خۆشەویستی‌یەکی ناڕەوا، چەشتنی ئازارێکی سەختی بێ‌بەزەیی‌یە" بە دەست تۆڵەی ڕەوای ئەم کارەتانەوە دەتلێنەوە. چونکە ئەو خۆشەویستی‌یەی کە تایبەتە بە خوای گەورەوە ئێوە بەخشیتان بە نەفسی خۆتان، وا لە ئەنجامی ئەمەشدا ئازاری لەژمارەبەدەری ئەم خۆشەویستەتان دەچێژن، چونکە لە حەوانەوەی ڕاستەقینەی خۆی بێ‌بەشتان کرد.. هەروەها کاروباری ئەم خۆشەویستەتان (خۆتان و دنیاتان) لە ڕێی تەوەککولەوە بە دەستی خۆش ویستراوی ڕاستەقینەتان، کە خواوەندی

خاوەن توانستی ڕەهایە، نەسپارد. لەبەر ئەوە، هەمیشە بەدەم ئازارەوە دەناڵێنن.. هەروەها ئەو خۆشەویستی‌یەی کە هی ناوە جوانەکان و سیفەتە پیرۆز و مەزنەکانی خوای گەورەیە، ئێوە داتان بە دنیا.. شوێنەوارەکانی سنعەتی ناوازەی خوای گەورەشتان بەسەر هۆکارە ماددی‌یەکاندا دابەش کرد، وا بەم بۆنەیەوە سزای ئەم کارەتان دەچێژن، چونکە بەشێك لە خۆشەویستە زۆرەکانتان، بێ‌خواحافیزی، پشتتان لێ هەڵدەکەن و دەڕۆن و هی وایان تێدایە کە هەر نایشتان ناسن! خۆ ئەگەر بیشتان ناسن ئەوا خۆشیان ناون، گەر خۆشیشیان بوێن، سوودتان پێ ناگەیەنن.. بەم چەشنە و بەردەوام لەناو ئەشکەنجەی ئازارێکی بێ سنووری جودایی و، نەمانی شتێکی ئومێدبڕاو لە گەڕانەوەی، هەر دەمێننەوە و دەتلێنەوە!

ئەمەیە ڕاستیی لاف و گەزافی گومڕایان و، ناوەرۆکی ئەو "بەختەوەریی ژیان" و "کەمالاتی مرۆڤ" و "چاکیی شارستانی" و "لەزەتی سەربەستی"یەی کە خەڵکی بۆ لا بانگ دەکەن!!

ئنجا بزانە کە پەردەی نەفامی و مەستی چەندە ئەستوورە، کە هەست و شعووری مرۆڤ ئاوا بەنج دەکات!

دەسا تۆیش بڵێ: بەدبەختی بۆ عەقڵی ئەو گومڕایانە!

بەڵام ڕێی ڕاست و ڕووناکی قورئانی پیرۆز: بە "ڕاستی‌یەکانی ئیمان" تیماری هەموو ئەو زامانە دەکات کە گومڕایان بە دەستیانەوە دەناڵێنن و، هەموو تاریکایی‌یە ناوبراوەکانی ئەو ڕێ‌یە دەرەوێنێتەوە و، گشت دەرگاکانی گومڕایی و تیاچوونیش دادەخات. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

ڕاستەشەقامی قورئان لە ڕێی تەوەککول و پشت بەستنەوە بە خوای بەتوانای میهرەبان و بەوەی کە هەرچی کۆڵی قورسی "بوون" و "ژیان" هەن، هەموویان بە دەستی توانست و میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە دەسپێرێت، چارەسەریی لاوازی و کۆڵەواری و هەژاری و موحتاجیی مرۆڤ دەکات و هیچ کۆڵێك ناخاتە ئەستۆیەوە، بەڵکو وا لە مرۆڤ دەکات کە ببێت بە خاوەنی جڵەوی خۆی و ژیانی، بەمەش پلەیەکی باشی حەوانەوەی بۆ دەدۆزێتەوە و تێی‌دەگەیەنێت کە مرۆڤ ئاژەڵی گۆیا(حیوان ناطق) نی‌یە، بەڵکو بە ڕاستی مرۆڤە و میوانێکی بەڕێز و ئازیزی پادشای میهرەبانە.

هەروەها ئەو زامانەی مرۆڤیش بە نەرمونیانی تیمار دەکات کە لە "نەمان"ی دنیا و شتان و "خۆشەویستیی" شمەکە فانی‌یەکانەوە دروست بوون، بەوەی کە پیشانی دەدات دنیا خانەی میوانداریی خواوەندی میهرەبانە و، بەوەی کە ڕوونی دەکاتەوە: هەرچی لە دنیادا هەن هەموویان ئاوێنەی ناوە خاوێن و جوانەکانی خوای گەورەن و، دەری دەخات کە:

بەدیهێنراوانی ناو دنیاش چەند نووسراوێکی پەروەردگاریی خواوەندن کە بە فەرمانی خۆی دەم بە دەم نوێیان دەکاتەوە. ئیتر مرۆڤ لە تاریکایی وەهم و ئەندێشەکان دەرباز دەکات.

هەروەها ئەو زامانەش سارێژ دەکات کە "مردن" لە بیری گومڕایاندا بەجێیان دەهێڵێت، چونکە "گومڕایی" مردنیان بە: جودایی هەمیشەیی لە هەموو خۆشەویستانیان، پیشان دەدات. بەڵام ئیمان ئەم زامانە بەوە تیمار دەکات کە ڕوونی دەکاتەوە "مردن": پێشەکیی شادبوون و بەیەك گەیشتنەوەیە لەگەڵ ئەو ئازیز و خۆشەویستانەی کۆچیان بۆ جیهانی بەرزەخ کردووە و ئێستا لە جیهانی مانەوەدان. دەیشی چەسپێنێت کە ئەو جیابوونەوەیە، لە ڕاستیدا، بەیەك شادبوونەوەیە.

هەروەها گەورەترین مەترسیی مرۆڤ ناهێڵێت، بەوەی کە دەیچەسپێنێت "گۆڕ" دەرگایەکە ڕووەو جیهانی میهرەبانیی فراوان و، خانەی بەختەوەریی هەمیشەیی و، باخچەکانی بەهەشت و، وڵاتی ڕووناکیی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان، خراوەتە سەرپشت.

هەروەها ڕوونی دەکاتەوە گەشتی بەرزەخ - کە بە لای گومڕایانەوە سەختترین و ناخۆشترین گەشتی ڕێی مرۆڤە و ڕێیەکی هەڵەت و بەردەڵانە دەیگرێتەبەر - خۆشترین و شادترین گەشتە، چونکە "گۆڕ" دەمی هەژدیهایەکی ترسناك نییە، بەڵکو دەرگایەکە لە ڕووی یەکێك لە باخچەکانی بەهەشتدا کراوەتەوە.

هەروەها بە ئیماندار دەڵێت:

گەر ویست و ئیختیاری تۆ بڕەکی و هەندەکین، ئەوا فەرموو کارەکانت بە ویستی هەمەکیی خوای گەورە بسپێرە.. ئەگەر توانات لاوازە، فەرموو پشت بە توانای ڕەهای خواوەندی بە توانا ببەستە.. ئەگەر ژیانت کەم و فانییە، ئەوا بیر لە ژیانی مانەوەی هەمیشەیی بکەرەوە.. ئەگەر تەمەنت کورتە، خەمت نەبێت، تەمەنێکی درێژت لەڕێدایە.. ئەگەر بیرت کزە، ئەوا بچۆرە ژێر تیشکی ڕووناکیی خۆری قورئانی پیرۆزەوە و بە نووری ئیمان بڕوانە تاکو هەر یەکێك لە ئایەتەکانی قورئان ڕووناکییەکی درەخشانی چەشنی ئەستێرەت پێ ببەخشێت، لە بریی ڕووناکیی کزی بیرت کە وەك هی گوڵەستێرە وایە.. ئەگەر ئازار و ئاواتی لەژمارەبەدەرت هەن، ئەوا بزانە چەندین پاداشت و میهرەبانیی نەبڕاوەی بێ سنوور چاوەڕێتن.. ئەگەر هیوا و مەبەستەکانت ئەوەندە زۆرن سنوورێك نییە کۆتاییان پێ بهێنێت، ئەوا بیریان لێ مەکەرەوە و خەمت نەبێت، چونکە لەم دنیایەدا هەرگیز جێیان نابێتەوە، بەڵکو شوێنی ئەوان چەند خانە و لانەیەکی ترە و، ئەوکەسەش دەیانبەخشێت سەخی و دەستڕەنگین و دارای بەخشندەیی یەکجار فراوانە.

هەروەها ڕوو لە مرۆڤ دەكات و پێی دەڵێت :

كاكی مرۆڤ! تۆ خاوەنی خۆت نیيت! بەڵكو بەندە و مولكی یەكێكی خاوەن توانست و میهرەبانیی ڕەهایت، كەواتە خۆت شەكەت و ماندوو مەكە و دەردیسەریی ژیانیشت مەخەرە ئەستۆی خۆتەوە. چونكە ئەو كەسەی ژیانی بەخشیوە هەر ئەویش بەڕێوەی دەبات.

ئنجا دنیاش بەرباد و بەرەڵا و بێخاوەن نییە، تاكو خەمی بۆ بخۆیت و كۆڵی ئەو لە ئەستۆی خۆت بنێیت و بیرت بە حاڵەت و بارودۆخەكانیەوە ماندوو بكەیت، چونكە خاوەنەكەی دانا و زانایە و، تۆیش تەنها میوانیت لە لای ئەو، كەواتە خۆت لە كاروبارەكانیدا هەڵمەقورتێنە و بێ تێگەیشتن لێیان، تێكەڵییان مەكە.

ئنجا وا نەزانی كە مرۆڤ و زیندەوەران بوونەوەرانێكی بەرەڵاكراون، نەخێر.. بەڵكو چەند فەرمانبەر و كار پێسپێرراوێكن لە ژێر سایە و بە سەرپەرشتی و فەرمانڕەوایی دانایەكی میهرەباندا. كەواتە بە بیركردنەوە لە دەردیسەری و ئازاری ئەوان، ئازار دەرخواردی "گیان"ی خۆت مەدە و، بەزەیی خۆت بەسەر بەزەیی بەدیهێنەری میهرەباندا پێش مەخە.

ئنجا جڵەوی ئەو شتانەش كە لە بەرامبەرتەوە چوونەتە سەنگەری دوژمنایەتی، هەر لە میكرۆبەكانەوە تا دەگاتە تاعوون و قاتی و بوومەلەرزە و لافاوەكان، تەنانەت جڵەوی هەموو شتێك، بە دەستی ئەو بەخشندە میهرەبانەوەیە، خۆ ئەویش دانایە و كاری بێهوودەی لێ ناوەشێتەوە و خاوەنی میهرەبانیی فراوانە، كەواتە هەرچییەك دەكات جۆرێكی چاكە و میهرەبانیی تێدایە..

هەروەها دەڵێت :

هەرچەند ئەم دنیایە فانییە و لە ئەنجامدا تیادەچێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێداویستییەكانی جیهانی هەمیشەیی ئامادە دەكات.. هەرچەندەش كاتی و لەناوچووە، بەڵام چەندین بەروبوومی تیانەچوو پێدەگەیەنێت و، چەندین درەوشانەوەی قەشەنگ و دڵگیری ناوە جوان و نەمر و، هەمیشەییەكانی خواوەند دەردەخات.. هەرچەندەش چێژ و لەزەتەكانی كەمن و ئازارەكانی زۆرن، بەڵام لوتف و بەزەیی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان و بەخششەكانی، لە خۆیاندا، چەند لەزەتێكی ڕاستەقینەی لەناونەچوون. ئازارەكانیش لەو ڕووەوە كە پاداشتی دواڕۆژیان بە دوادا دێت، چەندین تام و لەزەتی مەعنەوی بەرهەم دەهێنن.

مادەم بازنەی حەڵاڵ تابڵێی فراوانە و سەروزیادی ئەوەیە كە هەریەكە لە "گیان" و "دڵ" و "دەروون" لەزەت و خۆشیی تەواوی خۆیانی لێ وەربگرن، ئەوا هیچ پێویستییەك بەوە نامێنێتەوە كە بڕۆیتە ناو بازنەی حەرامەوە، چونكە تەنها یەك تام و لەزەتی ناو بازنەی

حەرام لەوانەیە هەزار و یەك ئازاری لێ ببێتەوە. سەرەڕای ئەوەی كە هۆی بێبەش بوونیشە لە تام و لەزەتی ڕێزلێنانی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان، كە تام و لەزەتێكی بێ گەرد و خاوێن و هەمیشەیی و بەردەوامە.

بەم جۆرە و بەپێی ئەمانەی پێشوو دەركەوت كە: ڕێی "گومڕایی" مرۆڤ دەهاوێتە نزمترینی پلە نزمەكانەوە، بە ڕادەیەك كە هیچ شارستانی و فەلسەفەیەك نەتوانێت چارەسەریی بۆ بدۆزێتەوە، تەنانەت پێشكەوتنی گرۆی مرۆڤ و ئەو پلە زانستییانەش كە بەدەستی هێناون هێشتا ناتوانن دەستی بگرن و لەو تاریكستانە چڕەی گومڕایی دەری بهێنن.

بەڵام قورئانی پیرۆز بە "ئیمان" و "كردەوەی چاك" دەستی مرۆڤ دەگرێت و لەو پلە هەرە نزمە دەری دەهێنێت و بۆ بڵندترین پلەی "بەرزی" سەری دەخات، بە چەندەها بەڵگەی گومانبڕ و بەهێزیش ئەمەی بۆ ڕوون دەكاتەوە. كەواتە ئەو كەندەڵان و شیوە قووڵانەی بە چەندین پلەی بەرزبوونەوەی مەعنەوی و ئامێری "تەواوكاریی گیان" بۆ پڕ دەكاتەوە و، بەوپەڕی ئاسانی گەشتی درێژی پڕ لە ماندوویی ڕووەو هەمیشەیی بۆ ئاسان دەكات، ئەویش بە پیشاندان و بەرچاوخستنی ئەو هۆكارانەی كە دەتوانرێت لە ڕێیانەوە ماوەی هەزار ساڵ، تەنانەت پەنجا هەزار ساڵیش، لە یەك ڕۆژدا ببڕێت!

هەروەها پۆشاكی "بەندایەتی" بە بەری مرۆڤ دەپۆشێت و، "كارمەندی"ی دەخاتە ئەستۆ و، دەیكات بە "میوان" و "فەرمانبەر" لای زاتێكی مەزن. ئەمەش لە ڕێی ئەوەی كە تێیدەگەیەنێت: خوای گەورە خاوەنی ئەزەل و ئەبەدە، بەمەش حەوانەوەیەكی تەواوی لە گەشتی دنیای خانەخوێ و مەنزڵگاكانی بەرزەخی خانەی دواڕۆژدا بۆ مسۆگەر دەكات، بە چەشنی ئەوەی كە فەرمانبەری دڵسۆزی پادشا زۆر بە ئاسانی لەناو فەرمانگەكانی موڵكی پادشادا هاتوچۆ دەكات و لە ڕێی هۆكارێكی گواستنەوەی خێرای وەك: فڕۆكە و پاپۆڕ و شەمەندەفەرەوە هەموو سنوورێكی وڵاتی پادشای دەگەڕێت. هەروەك ئەم فەرمانبەرە وایە، ئەو ئیماندارەش كە بەهۆی "ئیمان"ەوە پەیوەندی و نیسبەتی لەگەڵ خاوەنی موڵكی ئەزەلیدا بەستووە، بە بۆنەی: "كردەوەی چاك"ەوە، بەناو مەنزڵگاكانی دنیای خانەخوێ و فەرمانگەكانی جیهانی بەرزەخ و حەشر و سنوورە فراوانەكانیاندا، بە خێرایی برووسكە و بوراق، دەڕوات تا دەگاتە بەختەوەریی هەمیشەیی. قورئانی پیرۆز بە چەشنێكی گومانبڕ ئەم ڕاستییانە دەچەسپێنێت و، بە ئاشكرا بۆ ئەولیا و مرۆڤە خاوێن و بێ گەردەكانیان دەردەخات.

حەقیقەتی ئەم ڕێبەی قورئان هەر لە گوفتارەكەیدا بەردەوامە و، دەڵێت :

کاکی ئیماندار! لێهاتن و توانای لەڕادەبەدەرت بۆ "خۆشەویستی"، لە دەروونی بەدخوازی خۆتدا، کە ناشیرین و ناتەواو و خراپکار و زەرەرمەندە، بەکار مەهێنە و ئەو دەروونە بەدخوازەت مەکە بە خۆشەویستی خۆت و، ئارەزووەکانی مەپەرستە. بەڵکو ئەو کەسە بکە بە خۆشەویستی خۆت کە شایانی خۆشەویستی‌یەکی نەبڕاوەی بێ کۆتایی‌یە و، دەتوانێت بە بێ کۆتایی و بڕانەوە چاکەت لەگەڵدا بکات و بەختەوەریت پێ بدات. تەنانەت بەوەش بەختەوەریت پێ‌دەبەخشێت کە چاکەکاری و بەخششەکانی خۆی خەڵاتی ئەو کەسانەش دەکات کە تۆ پەیوەندیت لەگەڵیاندا هەیە، چونکە هەر ئەو کەسەیە کە خاوەنی کەماڵی ڕەها و جوانیی بێ عەیب و پاك لە هەموو ناتەواوی و قسوور و نەمان و تیاچوونێکە و، جوانیی ئەو بێ‌سنوورە و هەموو ناوەکانیشی جوان و ڕەنگینن.

بەڵێ، هەریەکە لە ناوە جوانەکانی ئەو، چەندەها ڕووناکیی بێ کۆتایی و سنووری جوانی تێدایە، "بەهەشت" بە هەموو نەرمونیانی و جوانی و ڕەنگینی و ناز و نیعمەتەکانیەوە، تەنها یەکێکە لە درەوشانەوەی پیشاندانی "جوانیی میهرەبانی" و "میهرەبانیی جوانی"ی ئەو، هەرچی جوانی و کەمالاتی خۆش ویستراوی ناو گەردوون هەن، هەر هەموویان تەنها ئاماژەیەکن بۆ "جوانی" و بەڵگەیەکن لەسەر "کەماڵ"ی ئەو خواوەندە مەزنە.

هەروەها دەڵێت :

کاکی مرۆڤ! کانیاوەکانی "خۆشەویستی" کە لە ناخی تۆدا هەڵدەقوڵێن و ڕوویان لە خوای گەورەیە و شەیدای ناوە جوان و سیفەتە مەزنەکانی ئەون، تۆ ئاراستەی بوونەوەرە فانی‌یەکانیان مەکە و بەم کارە لە نرخ و بەهایان دامەگرە و بێ‌سوود لەواندا مەیانفەوتێنە، چونکە هەرچەند شوێنەوارەکانی دەستەڵاتی خوای گەورە و بوونەوەرەکان لەناودەچن و نامێنن، بەڵام ناوە جوانەکان کە درەوشانەوە و جوانی‌یان بەسەر ئەو شوێنەوار و بوونەوەرانەوە بە ئاشکرا دیارە، دەمێننەوە و هەمیشەیین و، هەریەکە لە ناوەجوانەکان و سیفەتە بەرز و پیرۆزەکان، هەزاران پلەی چاکەکاری و جوانی و هەزاران چینی کەماڵیان تێدایە.

تەنها سەیری ناوی "الرحمن" بکە، با بۆت دەربکەوێت کە بەهەشت یەکێکە لە درەوشانەوەکانی و، بەختەوەریی هەمیشەیی یەکێکە لە بریسکانەوەکانی و، هەموو ڕزق و ڕۆزی و نیعمەتە بڵاوەکانی ناو دنیاش یەکێکن لە دڵۆپەکانی!

بە وردی بیر بکەرەوە و سەیری ئەو ئایەتە پیرۆزانە بکە کە ئاماژە بۆ ئەم بەراوردکاری‌یەی نێوان "گومڕایان" و "ئیمانداران" لە ڕووی ژیان و فەرمانبەری‌یەوە، دەکەن:

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإنسانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۞ ثُمَّ رَدَدْنَاه أَسْفَلَ سَافِلِينَ ۞ إِلاّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ (التين:٤-٦).

ئایەتەکەی تریش:

﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّماءُ والأَرْضُ﴾ (الدخان:٢٩) کە هەردووکیان ئاماژە بۆ پاشەڕۆژی هەردوو لا دەکەن، سەرنجیان بدە تاکو مەودای بەرزیی ئیعجازی ئەو دوو ئایەتەت بۆ دەربکەوێت لەو بەراوردکاری‌یەی کە بۆ ئەم دوو ڕێیەمان داناوە.

ڕوونکردنەوەی حەقیقەتی ئیعجازی کورت و پڕ واتای ئایەتی یەکەم "وتەی یازدەهەم" ڕوونی کردووەتەوە. وا لەمەولا تەنها ئاماژە بۆ مەودای گەیاندنی ڕاستی‌یەکی بەرز دەکەین کە ئایەتی دووهەم گەیاندوویەتی، ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

ئەم ئایەتە ڕاستەوخۆ بە ڕاشکاوی دەفەرموێ: ئاسمانەکان و زەوی بۆ مردنی گومڕایان ناگرین. واتا پێچەوانەکەشی دەفەرموێ: ئاسمانەکان و زەوی بۆ کۆچی ماڵئاوایی ئیمانداران لە دنیا، دەگرین! واتە لەبەر ئەوەی گومڕایان ئینکاریی کار و فرمانی ئاسمانەکان و زەوی دەکەن و بە "بێ مەبەستی" تاوانباریان دەکەن و، لە واتا و ناوەرۆکی ئەو ئەرکانە تێ‌ناگەن کە ئاسمانەکان و زەوی ئەنجامیان دەدەن، ئەوا مافی خۆیان نادەنێ، تەنانەت نە بەدیهێنەرەکەیان دەناسن و نە دەشزانن کە ئەمانە دەبن بە بەڵگە لەسەر بەدیهێنەریان! ئیتر بە چاوی سووك بۆ ئەو ئاسمانانە و زەوی دەڕوانن و، دوژمنایەتی‌یان دەکەن. دیارە ئاسمانەکان و زەویش تەنها بەمەندە وازناهێنن کە بۆیان نەگرین، بەڵکو دوعایان لێ دەکەن، تەنانەت خۆشحاڵیشن بە نەمانیان!

واتا پێچەوانەکەشی دەفەرموێت: ئاسمانەکان و زەوی بۆ مردنی ئیمانداران دەگرین و پەژارە دایاندەگرێت. چونکە ئیمانداران لە کار و فرمانی ئەوان ئاگادارن و ڕێزی شایانیان لێ دەگرن و حەقیقەتە ڕاستەکانیان دەسەلمێنن و، بە بۆنەی ئیمانەکەیانەوە لەو واتایانە تێ‌دەگەن کە لەو ئاسمانانە و زەوی‌دا هەن. ئەوەتا ئەوان تاکو زیاتر لە ئاسمانەکان و زەوی بیربکەنەوە، پتر بە سەرسووڕمانەوە دەڵێن: "چەندە جوان بەدی هێنراون! چەندەش ڕێك و جوان کارەکانیان ڕادەپەڕێنن" بەمەش ڕێزی شایانی خۆیان پێ‌دەبەخشن، چونکە لەبەر خوا و لەو ڕوانگەیەوە خۆشیان دەوێن کە ئاسمانەکان و زەوی چەند ئاوێنەیەکن بۆ درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە. لەبەر ئەوەیە کە کاتێك ئەهلی ئیمان دەمرن، ئاسمانەکان دەلەرێنەوە و وەك بڵێی بۆ کۆچی ماڵئاوایی ئەو ئیماندارانە بگرین ئاوا خەم دایاندەگرێت.

# پرسیارێكی گرنگ

پرسیار ده‌كه‌ن و ده‌ڵێن:

"خۆشه‌ویستی" به‌ ده‌ست مرۆڤ نی‌یه‌ و له‌ ویستی خۆمان به‌ده‌ره‌. ئه‌وه‌تا به‌پێی داخوازیی سروشتی خۆم حه‌زم له‌: خۆراكی به‌تام و له‌زه‌ت و میوه‌ی خۆشه‌ و، باوك و دایكم و مناڵه‌كانم و خێزانه‌كه‌م كه‌ هاوسه‌ری ژیانمه‌ و، پێغه‌مبه‌ره‌ به‌ڕێزه‌كان و، ئه‌ولیا و پیاوچاكان و، لاوی و، ژیانی خۆم و، هه‌موو شتێكی جوانم خۆش ده‌وێت. به‌ واتایه‌كی تر: من دنیام خۆشده‌وێت و ناتوانم ئه‌م خۆشه‌ویستی‌یه‌ پشتگوێ بخه‌م. به‌ڵام ئایا چۆن بتوانم ئه‌م هه‌موو جۆره‌ خۆشه‌ویستی‌یانه‌ پێشكه‌شی خوای گه‌وره‌ بكه‌م و خۆشه‌ویستی‌یه‌كه‌م بۆ ناوه‌ جوان و سیفه‌ته‌ مه‌زنه‌كان و زاتی خاوێن و پیرۆزی خوای گه‌وره‌ ئاراسته‌ بكه‌م و؟ ئه‌م كاره‌ چی ده‌گه‌یه‌نێت؟

**وه‌ڵام:**

فه‌رموو گوێ له‌م چوار سه‌رنجه‌ی خواره‌وه‌ ڕابگره‌:

**❑ سه‌رنجی یه‌كه‌م:**

هه‌رچه‌ند خۆشه‌ویستی به‌ ده‌ست مرۆڤ نی‌یه‌، به‌ڵام ده‌توانرێت به‌ "ویست"ی خۆی ڕووی ئه‌و خۆشه‌ویستی‌یه‌ بۆ خۆشه‌ویستێكی تر وه‌ربچه‌رخێنێت، وه‌ك ئه‌وه‌ی كه‌ ناشیرینی و ناوه‌ڕۆك و ڕاستیی خۆش ویستراوه‌كه‌ ئاشكرا بكرێت و ده‌ربخرێت.. یان بزانرێت په‌رده‌یه‌كه‌ به‌سه‌ر ڕووی خۆش ویستراوێكی ڕاسته‌قینه‌دا دادراوه‌ته‌وه‌ كه‌ ئه‌و شایانی خۆشویستنه‌.. یان بزانرێت ئاوێنه‌یه‌كه‌ جوانیی ئه‌و خۆشه‌ویسته‌ ڕاسته‌قینه‌یه‌ی تێدا ده‌رده‌كه‌وێت..

كاتێ ئه‌مه‌ ڕوون ده‌بێته‌وه‌، ده‌توانرێت ڕووی خۆشه‌ویستی‌یه‌كه‌ له‌ خۆش ویستراوی مه‌جازی‌یه‌وه‌ بۆ هی ڕاسته‌قینه‌ ئاراسته‌ بكرێت.

**❑ سه‌رنجی دووهه‌م:**

ئێمه‌ ناڵێین: هیچ كام له‌وانه‌ت خۆش نه‌وێت كه‌ ئێستا باست كردن، نه‌خێر. به‌ڵكو ده‌ڵێین: هه‌موو ئه‌وانه‌ت له‌ ڕێ و پێناوی خوادا خۆش بوێت..

بۆ نموونه‌: چه‌شتنی تامی خوارده‌مه‌نی و میوه‌ به‌له‌زه‌ت و خۆشه‌كان له‌گه‌ڵ یادكردنه‌وه‌ی ئه‌وه‌دا كه‌ چاكه‌ و نیعمه‌تی خوای گه‌وره‌ی به‌خشنده‌ی میهره‌بانن، خۆشویستنی دوو ناوی جوانی: "الرحمن" و "المنعم"ی خوای گه‌وره‌ ده‌گه‌یه‌نێت، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ هه‌مان

کاتیشدا بە شوکرانەبژێری‌یەکی مەعنەوی لەقەڵەم دەدرێت. ئنجـا بەوەشـدا دەزانین کە ئەو خۆشەویستی‌یە هی هەوا و ئارەزووی دەروون نەبووە و بۆ ناوی: "الرحمـن"ی خـوای گـەورە بووە، کە: مرۆڤ بـۆ ڕۆزیـی حـەڵاڵ تێبکۆشێت و بەدەستی بـهێنێت و لـە بازنـەی حـەڵاڵدا دارای قەناعـەتێکی تـەواو بێـت و، لـە کـاتی خـواردنی‌دا بیر بکاتـەوە کـە نیعمـەتی خـوای گـەورەیـە و شوکرانەی لەسـەر پێشکەش بکات.

پاشان خۆشویستنی دایك و باوکت و ڕێز گرتنیان، لە ڕاستی‌دا، بۆ خۆشەویستیی خـوای گەورە دەگەڕێتەوە، چونکە هەر تەنها ئەو خوایە بوو کە سۆز و میـهرەبانیی لـە دڵـی دایـك و باوکتدا ڕواند و، ئەوانیش بەوپەڕی میـهرەبانی و دانـایی چـاودێری و پـەروەردەیان کردیـت. نیشانەی ئەوەش کە لەبەر خوای گەورە خۆشت دەون، ئەوەیـە کـە: کاتێ ئـەوان پیر دەبن و بەساڵا دەچن و بە تەمای هیچ شتێك نابیت لێیان، ئەوپەڕی ڕێزیان لـێ بگریت و تا دەتوانیـت خۆشـت بوێـن و، هەرچـەندەش ئـەوان گـیروگرفتی زیـاترت بـۆ فەراهـەم بـهێنن و ئـەرکی سەرشانت پتر قورس بکەن، تۆ میهرەبانی و شەفەقەتی زیاتریان بۆ بنوێنیت. چونکە ئەم ئایەتـە پیرۆزە:

﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاهُمَا فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلاتَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَـوْلاً كَرِيماً ۞ واخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الـذُّلِّ مِـنَ الرَّحْمَـةِ وَقُـل رَبِّ ارْحَمْـهُمَا كَمَـا رَبَّيَـانِي صَغِيراً﴾(الإسراء:٢٣-٢٤).

داوا لـە منـاڵ و نـەوەکان دەکـات، لـە پێنـج پلـەدا، چـاودێریی دایـك و باوکیـان بکـەن، هەروەها مەودای گرنگیی ڕێزلێنان و خراپی و ستەمیی بێ گوێیی کردنیان دەردەخات.

جا مادەم خوای گەورە سروشتی باوکانی وا بـەدی هێنـاوە کـە حەسوودی‌یان بەرامبـەر کوڕ و نەوەی خۆیان تێدا نـەبێت و، بـەم پێ‌یـە بـاوك جگـە لـە کـوڕی خـۆی حـەز ناکـات لـە پێشبڕکێی ژیاندا کەسی تر پێشی بکـەوێت، ئـەوا لەبەر ئـەوە، هـەرگیز ڕێ بـە کـوڕ نـادرێت داوای مـاف لـە بـاوکی خـۆی بکـات، چـونکـە هـۆی نـاکۆکیی نێـوان دوو کـەس یـان حـەسـوودی و مونافەسەیە، یان پێ‌شێل کـردن و خـواردنی مـافی یەکێکیانـە لـە لایـەن ئـەوی تریانـەوە، بـەڵام خـۆ هـەر بـە سروشـت بـاوك ئـەم دوو شتەی تێدا نی‌یـە بەرامبـەر بـە کـوڕ و جگەرگۆشەی خۆی! کەواتە کوڕ مافی ئەوەی نی‌یە هیـچ داوایـەکی بەرامبـەر بـاوکی خـۆی بێت، تەنانەت ئەگەر باوکیشـی ستەمی لـێ بکـات، هێشـتا ئـەم مـافی ئـەوەی نی‌یـە بـەگوێی نەکات و هەڵوێستی نەشیاوی بەرامبەر بنوێنێت. واتـە ئـەو کەسـەی بەرامبـەر بـاوك و دایکـی خۆی ڕەفتاری نالـەبار دەنوێنێـت و ئازاریان دەدات، لە مرۆڤێتی دەرچووە و بووە بە ئاژەڵێکی دڕندە.

خۆشویستنی منالیش، بە هەمان جۆر، بریتی‌یە لە خۆشەویستیی خوای گەورە و لە روویەکەوە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، بەوەی کە مادەم ئەوان دیاری و بەخششی خواوەندی میهرەبانی بەخشندەن، ئەوا دەبێ بەوپەڕی شەفەقەت و میهر و بەزەیی‌یەوە چاودێری بکرێن..

نیشانەی ئەوەش کە خۆشەویستیی ئەوان لە پێناوی خوادایە، ئارامگرتن و شوکرانەبژێری‌یە لە کاتی بەڵا و موسیبەت، بە تایبەتی "مردن"یاندا، هەروەها ئومێدنەبڕین و دوعا بۆکردنیانە و، تەسلیم‌بوون و شوکرانەبژێری‌یە لە کاتی قەزا و قەدەردا. وەك ئەوەی بڵێت: ئەم بەدیهێنراوە، خۆشەویست و بەندەی بەدیهێنەری بەخشندەیە و، بۆ ماوەیەکی دیاریکراوی کەم پێی بەخشیبووم، ئێستاش دانایی ئەو خواوەندە خواستی لەسەر ئەوەبوو کە لە منی وەربگرێتەوە و بیبات بۆ شوێنێکی‌تری باشتر و پڕ ئاسایشتر، خۆ ئەگەر یەك بەشی رواڵەتیی منی پێوە بێت، ئەوا هەزار بەشی ڕاستەقینەی خوای گەورەی تێدایە. کەواتە چار نی‌یە دەبێ تەسلیمی بڕیاری خوای گەورە ببم.

خۆشویستنی برادەر و هاوەڵانیش، ئەگەر خاوەن ئیمان و تەقوا بن، مانای وایە ئەویش لە پێناوی خوادایە و بۆ ئەو دەگەڕێتەوە بەپێی دەستووری: "الحبّ في الله"[1].

خۆشویستنی ژنەکەیشت کە هاوسەری ژیانتە، با لەسەر ئەو بناغەیە بێت کە دیاری‌یەکی "هاودەم و نەرمونیانی" میهرەبانیی خوای گەورەیە. نەکەی ئەو خۆشەویستی‌یەت ببەستیتەوە بە جوانی‌یە رواڵەتی‌یەکەیەوە کە بە زوویی تەواو دەبێت و نامێنێت! بەڵکو بیبەستە بەو جوانی‌یەی کە هەرگیز ناڕوات و رۆژ بە رۆژ لە زیادبووندایە، ئەویش جوانیی ڕەوشت و هەڵسوکەوتی پاك و بێ‌گەردیەتی کە لە ناخی نەرمونیانیی ئافرەتدا ڕەگی داکوتاوە. بەرزترین و شیرینترین جوانیی ئافرەت لە سۆز و شەفەقەتە نوورانی و بێ‌گەردەکەی‌دایە، خۆ ئەم جوانیی شەفەقەت و ڕەوشتەش، هەمیشەیی‌یە و تا کۆتایی تەمەن هەر لە زیاد بووندایە و، تەنها بە خۆشویستنی ئەم دوو لایەنەشە کە مافەکانی ئەم بەدیهێنراوە لاواز و نەرمونیانە دەپارێزرێن. دەنا لە کاتێکدا کە جوانیی رواڵەتیی نامێنێت و لە هەموو وەختێك پتر پێویستی بە مافەکانی دەبێت، هەموو مافەکانی دەخورێن و پێ‌شێل دەکرێن!

خۆشەویستیی پێغەمبەران – درووودیان لەسەر بێت – و ئەولیا و پیاوچاکانیش، بە هەمان جۆر، لە ڕێی خوادایە، لەو ڕووەوە کە ئەوان چەند بەندەیەکی بێ‌گەرد و وەرگیراوی لای خوای گەورەن. خۆشویستنی ئەوان، لەم گۆشەیەوە دەبێ بە خۆشویستنی خوای گەورە.

ئەو ژیانەش کە خوای گەورە بە تۆ و هەموو مرۆڤێکی تری بەخشیوە، سەرمایەیەکی هێندە گەورەیە کە دەتوانیت ژیانێکی نەبڕاوەی دوارۆژی پێ بەدەست بهێنیت و، گەنجینەیەکە

---

(١) الحب في الله والبغض في الله من الإيمان. صحيح البخاري، كتاب الإيمان، من كلام الإمام البخاري. (وەرگێڕ).

چەندین ئامێر و کەماڵاتی نەمری تێدایە. جا خۆشویستن و پارێزگاری کردنی ژیان لەم گۆشەیەوە و، ڕامکردن و بەکارهێنانی لە پێناوی خوادا، بە خۆشەویستیی خوای گەورە دادەنرێت.

پاشان خۆشویستنی لاوی و جوانییەکەی و ڕێزلێنانی لەو ڕووەوە کە نیعمەتێکی نایاب و قەشەنگی پەروەردگارە و بەکارهێنانی بە باشی، خۆشەویستییەکی ڕەوایە و شایانی ڕێزە.

پاشان خۆشویستنی بەهار، لەو ڕووەوە کە قەشەنگترین لاپەڕەی دەرکەوتنی نەخش و نیگارەکانی ناوە جوان و ڕووناکەکانی خوای گەورەیە و، مەزنترین پیشانگایە بۆ پیشاندانی وردەکاریی سنعەتی بێ وێنەی پەروەردگار. بیرکردنەوە لە بەهار لەم ڕووەوە، ڕووی لە ناوە جوانەکانی خوای گەورەیە و لە پێناوی خوادایە.

تەنانەت خۆشویستنی "دنیا"ش ئەگەر لەو گۆشەیەوە بێت کە: کێڵگەی دوارۆژە و، ئاوێنەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەیە و، چەند نامەیەکی پەروەردگارە بۆ "بوون"(الوجود)ی ناردووە، بە مەرجێك دەروونی بەدخواز خۆی لەو خۆشەویستییەدا هەڵنەقورتێنێت، خۆشویستنی دنیا لەم گۆشەیەوە، ئەویش دەبێ بە خۆشەویستییەك لە پێناوی خوای گەورەدا.

پوختەی ئەم قسانە: هەموو دنیا و بەدیهێنراوانی ناو دنیات بە واتای "حەرفی" خۆش بوێت نەك بە واتای "ئیسمی".

واتە: نەك لەبەر خۆیان، بەڵکو لەبەر ئەو واتایانەی ڕایاندەگەیەنن، خۆشت بوێن..

بە هیچ شتێك مەڵێ: "ئەمە چەندە جوانە" بەڵکو بڵێ: "چەندە جوان بەدی هێنراوە"! نەکەی هیچ کەلێنێك بهێڵیتەوە کە خۆشەویستیی غەیری خوای لێ بڕواتە ناو دڵتەوە، چونکە ناوەوەی دڵت ئاوێنەی خواوەندی صەمەدە و تایبەتە بەو، هەردەم بڵێ: "اللهم ارزقنا حبك وحبّ مايقربنا إليك"(١).

جا ئەو هەموو جۆرانەی "خۆشەویستی" گەر بەو شێوەیەی باسمان کردن، بەرەو ڕووکاری ڕاستی خۆیان ئاراستە بکرێن. واتە: ئەگەر لەبەر خوا و لەپێناوی ئەودا بن، ئەوا لەزەتێکی ڕاستەقینەی بێ ئازار و، بەیەك شادبوونێکی بێ کۆتایی بەرهەم دەهێنن، تەنانەت خۆشویستنی خوای گەورەش زیاد دەکەن، سەرەڕای ئەوەی کە خۆشەویستییەکی ڕەوا و

(١) فەرموودە لە بارەی دوعاکردن بۆ دەستکەوتنی خۆشەویستیی خوا زۆرە. وەك ئەمە: "عن عبدالله بن يزيد الخطمي الانصاري عن رسول الله ﷺ انه كان يقول في دعائه: اللهم ارزقني حبك وحب من ينفعني حبه عندك" أخرجه الترمذي وقال: حسن غريب.

حەلاڵە و لەهەمان كاتیشدا شوكرانەبژێریی خواوەنـدە و، بیركردنەوەیە لـە نیعمەتـەكانی ئـەو خوایە لە ناوەندی هەمان خۆشەویستی‌دا.

ئەمەش بە نموونەیەك ڕوون دەكەینەوە:

گەر پادشایەكی مەزن[1] سێویكی پێشكەش كردیت، ئەوا بە دوو جۆر حەز لـەو سێوە دەكەیت و، بە دوو شێوە لەزەتی لێ دەبەیت:

حـەز و خۆشویستنی یەكـەمیان هـی سێوەكەیە، كە میوەیەكی خۆشە و، بـە ئـەندازەی تایبەتكاری‌یەكانی پێكهاتنی، لەزەتی لێ دەبەیت. ئەم حـەز و خۆشویستنە هـی پادشا نی‌یـە، تەنانـەت ئەگـەر یـەكێك بە هەڵپە و لـە بـەردەم پادشـادا سێوەكە بخوات، دەری‌دەبڕێـت كـە سێوەكەی خۆش دەوێـت نـەك پادشا! لەوانەیە پادشا ئەم هەڵسوكەوتەی بەلاوە كـارێكی نەشیاو بێت و، بێز لـەو خۆویستـی‌یە تونـد و دەروونپەروەری‌یـە لەڕادەبەدەرە بكاتـەوە. ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی كـە لـەزەتی ئـەو سێوە لـەزەتێكی كاتی‌یـە و لەنەماندایـە، چونكـە لەگـەڵ تەواوبوونی خواردنی، لەزەتەكەشی تەواو دەبێت و ئازاری نەمانی بەجێ دەهێڵێت.

حەز و خۆشویستنی دووهەمیان هی ڕێزلێنانەكەی پادشایە، كـە بـە چـاوی ڕێـزەوە ئـاوڕی لـێ داویتەوە و بە پێشكەش كردنی سێوەكە ئەمەی دەربڕیوە. وەك بڵێی ئەو سێوە نموونەیـەكی ئاوڕلێدانـەوە و ڕووتێكردنی پادشایە، یـان ستایشێكی بەرجەستەی ئـەوە. جـا ئـەو كەسـەی دیـاریی پادشـا بـە خۆشەویستی و ڕێـزەوە وەربگرێـت، دەری دەبڕێـت كـە پادشـای خـۆش دەوێـت، نـەك سێوەكە. دەبێ بیشـزانین تـام و لـەزەتی ئـەو سـێوە ـ لەبـەر ئـەوەی مایـە و پیشاندەری ڕێزلێنانەكەی پادشایە ـ لە هـی هـەزاران سێوی تـر زیـاترە، هەسـت كردنیش بـەم لەزەتە زیادەیە، خۆی لـە خۆی‌دا، شـوكرانەبژێریی ئـەو بەخشینەیە و، ئـەم خۆشەویستـی‌یەش خۆشەویستی‌یەكی خاوەن ڕێزە و شایانی پادشایە.

بە چەشنی ئەم نموونەیە، گەر بێت و مرۆڤ بێ‌ئاگایانە حەز و خۆشەویستیی ڕاستەوخۆ بـۆ نیعمەت و میوەكان ئاراستە بكـات و تەنـها تـامی لەزەتـە ماددی‌یـەكانیان بچێژێـت، ئـەوا ئـەو خۆشەویستی‌یەی هی دەروونە و لە ڕاستی‌دا نەفس‌پەروەری‌یە و، لـە ئەنجامیشـدا ئەو لەزەتانـە لەناودەچن و ئازار بەجێ دەهێڵن. بەڵام ئەگەر ئەو حەز و خۆشەویستی‌یە ڕوویـان لـەو لایەنـە بێت كە بەخششی پەروەردگار و، میهرەبانی و بەرهەمی چاكەكاریی خوای گەورەن و، ڕێـز لە پلەكانی ئەو چاكەكاری‌یە بگرێـت و، بە تـەواوی تامیـان بچێژێـت، ئـەوا ئـەم كـارەی، لـە ڕاستی‌دا، شـوكرانەبژێری‌یەكی مەعنەوی‌یـە و لەزەتێكـە هـەرگیز دوای خـۆی ئـازار بـەجێ ناهێڵێت.

---

(١) ئەم ڕووداوە، كـاتی خـۆی لـە ڕاستی‌دا ڕووی داوە كـە جارێكیـان دوو سـەرۆك هـۆز پێكـەوە ڕۆشـتوونەتە لای پادشایەكی مەزن و ئەو ڕەفتارانەی سەرەوەیان نواندووە. (دانەر).

❑ سەرنجی سێهەم:

ئەو خۆشەویستی‌یەی ڕووی لە ناوە جوانەکانی خوایە، چەند چینێکی هەیە:

کاتی وا هەیە لە ڕێی خۆشویستنی شوێنەوارەکانی جێ دەستی خواوەند لە گەردووندا - وەك زووتر باسمان کرد - خۆشەویستی‌یەکەت ئاراستەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە دەکەیت..

کاتی وا هەیە بۆیە ئەو ناوە جوانانەت خۆش دەوێت چونکە ناونیشانی کەماڵاتی بەرزی خوای گەورەن..

کاتی وا هەیە مرۆڤ گەلێ پێویستی بەو ناوانەیە، لەبەر ئەوە تاسەمەندیان دەبێت، چونکە چییەتیی مرۆڤ گشتی‌یە و، پێداویستی‌یەکانیشی بێ‌سنوورن. واتە: لەبەر پێویستیی بەو ناوانە، خۆشی دەوێن. با بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بکەینەوە:

وا دابنێ لەو کاتەدا کە هەست بە کۆڵەواری و دەستەوسانیی خۆت و پێویستیی زۆر دەکەیت کە یەکێك بۆ ڕزگاربوونی خۆشەویستێکت لە خزمان و هەژاران، تەنانەت بۆ فریاگوزاریی بوونەوەرە لاوازە داماوەکانیش، بێت و یارمەتیت بدات، گەر کتوپڕ لەم کاتەدا یەکێك پەیدا ببێت و چاکە و نەوازش لەگەڵ ئەوانەدا بنوێنێت و بە ئارەزووی دڵی تۆ نیعمەتی خۆی بدات بەوان، چەندە شادمان دەبیت و چەندەش دڵت بە ناوی: "المنعم" و "الکریم"ی ئەو دەکرێتەوە و دەگەشێتەوە؟ تەنانەت چەندە جێی ڕێز و مایەی سەرسووڕمانت دەبێت و بە خۆشویستنی ئەو دوو ناو و ناونیشانەی ئەو، هەردەم ڕووی خۆشەویستیی ئاراستە دەکەیت؟!

هەر لە ڕووناکیی ئەم نموونەیەوە، بیر لە تەنها دوو ناو بکەرەوە لە نێوان ناوە جوانەکانی خوای گەورەدا، کە دوو ناوی: "الرحمن" و "الرحیم"ن. کاتێك بیریان لێ دەکەیتەوە و سەرنجیان دەدەیت، دەبینیت: هەموو ئیمانداران لە: باوك و باپیرانی پێشووت و، گشت خۆشەویست و، کەسوکار و، برادەرانت کە خۆشت دەوێن و شەفەقەتت بەرامبەریان دەبزوێت و تاسەمەندیت بۆ بینینیان، هەموو ئەوانە، لە دنیادا چەشتنی چەندین نیعمەتی بەلەزەتیان پێ دەبەخشرێت و، پاشانیش لە دواڕۆژدا بە خۆشترین و بەتامترین نیعمەت بەختەوەر دەکرێن، تەنانەت خوای گەورەی "ڕەحمان" و "ڕەحیم" بەختەوەری و نیعمەتی زیاتریان پێ دەبەخشێت، بەوەی کە بە یەکتریان شاد دەکاتەوە و بە بینینی جوانیی هەمیشەیی خۆیشی بەهرەمەندیان دەکات. کەواتە دەبێ هەردوو ناوی: "الرحمن" و "الرحیم" چەندە شایانی خۆشویستن بن و گیانی مرۆڤ چەندە تاسەمەندیان بێت؟ بۆ خۆت ئەمە لێك بدەرەوە، بابزانیت چەندە ئەو وتەیەمان ڕاستە کە دەڵێین: "الحمد لله علی رحمانیته ورحیمیته"!

پاشان تۆ پەیوەندیت بە بوونەوەرانی ڕووی زەوی‌یەوە هەیە و، بە دەردی‌سەری و بەدبەختیی ئەوان ئازار دەچێژیت، وەك بڵێی تێکڕای گۆی زەوی خانە و لانەی جوان و ئاوەدانی تۆ بێت. جا ئەگەر بە وردی سەرنج بدەیت، شەوقێکی زۆر و پێویستی‌یەکی توندوتیژ لە ڕۆحی خۆتدا هەست‌پێ‌دەکەیت بەرامبەر ناوی: "الحکیم"ی خوای گەورە و ناونیشانی: "المربـــــــي" کە بە دانایی‌یەکی تەواو و کارگوزاری‌یەکی بێ وێنە و ڕێکخستنێکی ورد و پەروەردەکاری‌یەکی میهرەبانانە، ئەو گشت بوونەوەرانە ڕێکدەخات.

پاشان ئەگەر بیر لە هەموو مرۆڤایەتی بکەیتەوە، دەبینیت پەیوەندیت پێیانەوە هەیە و، بۆ بارودۆخی کڵۆڵی و بەدبەختیی ئەوان ئازار دەچێژیت و، بە نەمان و مردنیشیان ئازارەکەت پتر زیاد دەکات، لەم کاتەدا دەبینیت "گیانت" تاسەمەندی ناوی: "الــــوارث، البـاعث"ی خوای گەورەیە و، پێویستی بە ناونیشانی: "الباقي، الکریـم، المحي، المحسن"ی بەدیهێنەری بەخشندەیە کە هەموو ئەو مرۆڤانە لە تاریکستانی نەبوون ڕزگار دەکات و، لە خانە و لانەیەکی دیکەی چاکتر و جوانتر لەوەی دنیایان نیشتەجێ‌یان دەکات.

هەروەها لەبەر ئەوەی چییەتیی مرۆڤ بەرزە و سروشتەکەشی گشتی‌یە، ئەوا هەزار و یەك پێویستیی بە هەزار و یەك ناوی جوانی خوای گەورە و بە چەندەها پلەی جیاجیای هەموو یەکێك لەو ناوانە هەیە. جا "پێویستی"ی دووچەندانە(مضـــاعف) بریتی‌یە لە "شەوق".. شەوقی دووچەندانەش بریتی‌یە لە "خۆشەویستی".. خۆشەویستیی دووچەندانەش "عیشقە". کەواتە بەپێی کامڵ بوونی ڕۆحی مرۆڤ و بەپێی پلەکانی ئەو ناوانە، پلەکانی خۆشەویستیش دەردەکەون. خۆشەویستیی ئەو ناوانەش لە ئەنجامدا دەبن بە خۆشویستنی زاتی مەزنی خوای گەورە، چونکە ئەو ناوانە تایبەتن بە خوای گەورە و درەوشانەوەکانیەوە.

وا لە نێوان هەزار و یەك ناوی خوای گەورەدا - بۆ نموونە - تەنها یەك پلە لە نێوان هەزار و یەك پلەی ناوی: "العدل، الحکم، الحق، الحکیم"ی خوای گەورە، بەم جۆرەی خوارەوە ڕوون دەکەینەوە:

ئەگەر دەتەوێت ئەو ناوی "الرحمن، الرحیم، الحق"ەی کە لە چوارچێوەی "دانایی و دادگەری"دا و لە نێوان بازنەیەکی فراوانی مەزندا هەیە بیانبینیت، ئەوا بیر لەم نموونەیە بکەرەوە:

سوپایەك چوارسەد هەزار تیرەی جۆراوجۆری سەربازی تێدایە، هەریەکەیان بەپێی حەزی خۆیان، بەرگ و پۆشاك و خواردەمەنی‌یان لەوانی تر جیایە و، هەریەکەیان کام چەکیان بە ئاسانی بۆ بەکاردەهێنرێت ئەوەی هەڵگرتووە و، چ چارەسەری‌یەکیشیان بۆ دەگونجێ بەوە چارەسەر دەکرێت. ئنجا هەرچەند ئاوا لە هەموو شتێکیاندا لە یەکتر

جیاوازن، کەچی بەپێی تیپ و لەشکر لە یەکتر جیانەبوونەتەوە، بەڵکو بێ جیاوازی تێکەڵی یەکتر بوون و بە یەکدا ئاڵاون.

جا ئەگەر پادشایەك بێت، لەبەر ئەوەی خاوەنی بەزەیی و میهرەبانی و توانست و زانستێکی گشتیی بەهەموو شت ئاگا بێت و، دارای دادگەرییەکی بێ وێنە و دانایییەکی تەواو بێت، هەریەك لەو سەربازانە چ جۆرە بەرگ و پۆشاك و خۆراك و چارەسەری و چەکێکی بۆ دەگونجێ ئەوەیان پێ بدات، بێئەوەی کەسیانی لە بیر بچێت و کارەکەی لێ بشاڵۆزێت و بێ ئەوەش هیچ یاریدەدەرێکی ببێت، بەڵکو بە تەنیا خۆی هەموو ئەمانەیان بەسەردا دابەش بکات.. بەڵێ، ئەگەر پادشایەکی ئاوا بێ وێنە ببێت، ئەوا ئەو کاتە ڕادەی توانایی و میهرەبانی و دادگەریی ئەوت بۆ دەردەکەوێت. چونکە ئاشکرایە گەر تابوورێکی سوپا کە تەنها لە (دە) تیرەی جیاجیا پێکهاتبێت، گەلێ قورس و دژوارە بتوانرێت چەك و تەقەمەنی و بەرگ و پۆشاکی جیاجیایان بۆ دابین بکرێت، بۆیە لە ناچاریدا هەموویان بە یەك چەشن بەرگ و پۆشاك و چەك و تەقەمەنییان دەدرێتێ، هەرچەندەش ڕەگەز و نەتەوەیان جیاواز بێت..

جا ئەگەر دەتەوێ لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە درەوشانەوەی ناوی خاوێن و جوانی: "الحق" و "الرحمن الرحیم"ی خوای گەورەت لە چوارچێوەی "دادگەری" و "دانایی"دا بۆ دەربکەوێت، ئەوا فەرموو سەیری بەهار بکە و بۆ ئەو خێوەتانە بڕوانە کە بەسەر ڕووی زەویدا هەڵدراون، کە هی چوارسەد هەزار نەتەوەی جۆراوجۆرن و سوپایەکی مەزنیان لە ڕووەك و زیندەوەران پێکهێناوە.. بە وردی سەیریان بکە، دەبینیت هەرچەند ئەم هەموو تیرە و نەتەوانە تێکەڵ و پێکەڵن و، بەرگ و پۆشاکیان لە یەکتر جیاوازە و، خواردەمەنیشیان لە هی یەکتر ناچێت و، چەکیان جۆراوجۆرە و، ڕێ و شوێنی گوزەرانیان جیاوازە و، مەشق و تەعلیماتی هەریەکەیان لەوی تر جیایە و، تەسریح بوون و پشوودانیشیان لە یەکتر ناچێت، هیچ کامیشیان زمانیان نییە تاکو داوای پێداویستی و دابین کردنی ئارەزووەکانیانی پێ بکەن.. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هەریەکەیان بە ناوی: "الحق و، الرحمن و، الرزاق و، الرحیم و، الکریم"ەوە و لە چوارچێوەی "دانایی و دادگەری"دا و، بە تەرازوویەکی ورد و ڕێکوپێکییەکی بەرز، بەڕێوەدەبرێت و پەروەردە و چاودێری دەکرێت. دەسا فەرموو سەیری ئەم درەوشانەوەیە بکە و سەرنجی لێ بدە، باشە ئایا دەگونجێ جگە لە خوای گەورە کەسی تر بتوانێت لەم کارەدا، کە بەو ڕێسا ناوازە و تەرازووە وردە بەڕێوەدەبرێت، خۆی هەڵبقورتێنێت؟ ئایا دەگونجێ هیچ هۆکارێك - هەرچی بێت - لەم سنعەتە قەشەنگ و کارگوزارییە دانایانە و، پەروەردگارییە میهرەبان و بەڕێوەبردنە گشتییەدا دەست وەربدات، جگە لە خوای گەورەی تاکی تەنیای دانای بەتوانا بەسەر هەموو شتێکدا؟!

❑ **سه‌رنجی چواره‌م:**

تۆ ده‌ڵێیت: چه‌ندین جۆری جیاجیای حه‌ز و خۆشه‌ویستی لـه‌ ده‌روونمـدا هه‌ن بۆ: خوارده‌مه‌نیی به‌له‌زه‌ت و، ژن و، منال و، دایك و، باوك و، خۆشه‌ویست و، برا ده‌رانم و، پیاوچاكان و، پێغه‌مبه‌ره به‌رێزه‌كان، ته‌نانه‌ت هه‌موو شتێكی جوان و به‌هاری ره‌نگین و دنیام به‌گشتی خۆش ده‌وێت.. ئایا ئه‌گه‌ر ئه‌م هه‌موو جۆره جیاجیایانه‌ی خۆشه‌ویستیم به‌پێی داخوازی‌یه‌كانی قورئانی پیرۆز بن چ ئه‌نجام و سوودێكیان ده‌بێت؟

**وه‌ڵام** :

روونكردنه‌وه‌ی ئه‌و هه‌موو سوود و ئه‌نجامانه پێویستی به نووسینی كتێبێكی مه‌زن ده‌بێت. له‌به‌ر ئه‌وه، ئێمه لێره‌دا به كورتی ئاماژه بۆ ته‌نها یه‌ك‌دوو ئه‌نجام له‌و ئه‌نجامانه ده‌كه‌ین. له پێشاندا ئه‌و ئه‌نجامانه روون ده‌كه‌ینه‌وه كه له دنیادا دێنه‌دی، پاشان ئه‌وانه‌ی كه له دوارۆژدا ده‌رده‌كه‌ون، ئه‌ویش به‌م جۆره‌ی خواره‌وه:

زووتر باسمان كرد: جۆره‌كانی خۆشه‌ویستی لای بێ‌ئاگایان و ئه‌هلی دنیا، كه ته‌نها بۆ دابین كردنی ئاره‌زووه‌كانی ده‌روونیانه، چه‌نده‌ها ئه‌نجامی به‌سوێ و ئازار و به‌ڵا و ده‌ردی سه‌ریی هه‌یه، له‌گه‌ڵ ئه‌و كه‌یف و شادی و حه‌وانه‌وه كه‌م و بچووكه‌ی كه تیایدایه.

بۆ نموونه: به بۆنه‌ی كۆڵه‌واری‌یه‌وه، "شه‌فه‌قه‌ت"ه‌كه‌یان ده‌بێت به به‌ڵایه‌كی ئازاردار.. "خۆشه‌ویستی"ش لای ئه‌وان، به‌هۆی جودایی و لێكدابرانه‌وه، ده‌بێت به كسپه‌ی ده‌روون و.. "له‌زه‌ت"یش، به‌هۆی نه‌مانیه‌وه، ده‌بێت به شه‌رابێكی ژه‌هراوی. هیچ كامیشیان له دوارۆژدا هیچ سوودێكیان نابێت، چونكه هیچیان له پێناوی خوادا نه‌بوون. خۆ ئه‌گه‌ر مرۆڤیان خستبێته كاری حه‌رامه‌وه، ئه‌وا له دوارۆژدا ئازار و ئه‌شكه‌نجه‌ی سه‌ختی ده‌رخوارد ده‌ده‌ن.

**پرسیار**: خۆشه‌ویستیی پێغه‌مبه‌ره به‌رێزه‌كان - درووودیان له‌سه‌ر بێت - و ئه‌ولیا و پیاوچاكان چۆن بێ سوود و قازانج ده‌رده‌چێت؟

**وه‌ڵام**: به چه‌شنی سوودوه‌رنه‌گرتنی ئه‌و گاورانه‌ی كه باوه‌ڕیان به "تثلیث" هه‌یه له خۆشویستنی حه‌زره‌تی عیسا - درووودی له‌سه‌ر بێت - و، رافزی‌یه‌كانیش له خۆشویستنی حه‌زره‌تی عه‌لی، خوای لێ رازی بێت!

ئنجا ئه‌و جۆره خۆشه‌ویستی‌یانه‌ش كه باست كردن، ئه‌گه‌ر به‌پێی رێنمایی قورئانی پیرۆز و له پێناوی خوای گه‌وره و خۆشه‌ویستیی "به‌خشنده‌ی میهره‌بان"دا بێت، ئه‌وا

چـەندەها بەرهــەمی جوانــی لــە دنیــادا دەبێــت، چ جــای ئەنجامــە خــاوێن و جــوان و هەمیشەیی‌یەکانی ئەودنیا.

**ئەنجامەکانی سەر بە دنیایان ئەمانەن:**

حـەز کردنـت لـە خواردەمـەنی و میوەی بەلـەزەت و خۆش، ئەو خواردەمەنی‌یانـەت بـۆ دەکـات بـە نیعمــەتێکی بێ‌ئـازاری بەخشـراوی خـوای گـەورە و، لـەزەتێك لـە نـاوەندی شوکرانەبژێری‌دا..

خۆشویستنی نەفسیشـت، لـەو ڕووەوە کـە بـەزەییت پێدابێتـەوە و لـە پـەروەردە و پـاکژ کردنـی‌دا خـۆت مـاندوو بکـەیت و لـە ئـارەزووی نـزم و خـراپ دووری بخەیتـەوە، ئـەم خۆشویستنە، جڵەوی ئەو نەفسەت دەداتە دەست و ئیتر هەوای ئەو نەفسە نات‌بەستێتەوە و لـە ئارەزووەکانی خۆی‌دا ناتخاتـەکار، بـەڵکو تۆ هـەر بۆ خۆت ئەو بەرەو ڕێی ڕاسـت - نـەك هـەوا و ئـارەزوو - دەدەیتەبەر..

خۆشویستنی خێزانەکەشت کە هاوسەری ژیانتە، مـادەم لەسـەر بناغـەی ڕەوشـت‌جوانیی بەشەفەقەتی ئەو دامەزراوە و لەو ڕووەوە خۆشت دەوێت کە دیاریی میـهرەبانیی خوایـە، ئەوا دیارە خۆشەویستی و میهرەبانی‌یەکی ڕاست و بەسۆز و بەزەیی لـە ڕوودا دەنوێنیـت، ئەویش بەرامبەر بەمـە تۆی خـۆش دەوێـت و ڕێـزت لـێ دەگرێـت، خـۆ هـەتا تەمەنیشـتان بـەرەوپێش بڕوات و بەساڵا بچن، ئەم ڕێز و خۆشەویستی‌یە چون‌یەکـەی نێوانیشـتان هـەر زیـاد دەکـات، ئیتر بە ئیزن و فەرمانی خوای گەورە، بۆ خۆتان ژیانێکی شاد و پڕ بەختەوەری بەسـەر دەبـەن. بـەڵام ئەگـەر ئـەو خۆشەویستی‌یە لەسەر بناغـەی جوانیــی ڕواڵــەتیی بێـت، کـە داخـوازی دەروونە، ئەوا بە زوویی نامێنێت و ژیانی ژن و مێردایەتیش بە جارێ تێکدەچێت.

خۆشویستنی دایك و باوکیشت، مادەم لە پێناوی خوادا بێت، پاداشتت لە سەری دەست دەکەوێت. بێ‌گومان کاتێ پیریش دەبن خۆشەویستی و ڕێزیـان زیـاد دەکـەیت و، هەسـت بـە لەزەتێکی ڕۆحیی بێ‌گەرد و حەوانەوەیەکی تەواوی دڵی خۆت دەکەیت کاتێ کە دەبیت بـە خزمەتگوزاریان و دەستیان ماچ دەکەیت و بە دڵسۆزی و ئیخلاسەوە ڕێزیـان دەگریـت، ئیـتر کـە تۆ لـەم هەستە بـەرز و هیمـمـەت و لێبڕانــەدا دەبیـت، لـە خـوای بـەتوانای باڵادەسـت دەپاڕێیتـەوە تەمـەنیان درێـژ بکـات، تـاکو پاداشـتی زیـاتـرت دەسـت بکـەوێت.. بـەڵام ئـەو خۆشەویستی و ڕێزەت ئەگـەر لەبـەر دەستخسـتنی کەرەسـە و شمـەکی بێ‌کـەڵکی دنیـا و هەڵقوڵاوی ئارەزووی دەروون بێت، ئەوا ئازارێکی گیانیی تـاریك بەرهـەم دەهێنێـت کـە لـە هەستێکی نزمـەوە سـەری هـەڵداوە، ئـەویش نەفرەت‌کردنـە لـەو دوو کەسـەی هـۆی بـوون و ژیانتن و، بە قورس زانینیانە بەسەرتەوە کاتێك کە پـیر دەبـن، ئنجـا لـە هـەموو شتێك خراپـتر: ئاواتەخوازیی مردنیان و چاوەڕوانیی نەمانیانە!

خۆشویستنی منالەکانیشت، واتە خۆشویستنی ئەوانەی کە خوای گـەورە بـە ئەمانـەت بـە تـۆی سـپاردوون تـاکو پـەروەردە و چاودێریـان بکـەیت، خۆشویسـتنی ئـەو هاودەمـە خۆشەویستانەی بەدیهێنراوانی خوا، خۆشەویستی‌یەکی پڕ بەختـەوەری و کامەرانی‌یـە و، لـە هەمان کاتیشدا نیعمەتێکی خوای گەورەیە. جا کە تۆ هەستت بەمە کرد، ئـەوا هـەرگیز خـەم بۆ ئەو موسیبەتانە مەخۆ کە ئـەوان دووچاری دەبن و، بـە مردنیشیان ئـاخ و داخـی پـەژارە و حەسرەت هەڵمەکێشە، چونکە - وەك زووتر باسمـان کـرد - بەدیهێنـەری ئەوانـە میهرەبانـە و بـەزەیی پێیـاندا دێتـەوە و بـە دانـایی کاروباریـان بـۆ ڕێـك دەخـات. کاتـێ لـەم ڕاسـتی‌یە تێ‌گەیشتیت، خۆت بە خۆت دەڵێیت: "مردن بۆ ئەوان بەختەوەری‌یە". ئیـتر بەمـە لـە ئـازاری جودایی ڕزگار دەبیـت و بیر لـەوە دەکەیتـەوە کـە لـە خـوای میـهرەبان بپاڕێیتـەوە لـە سـۆز و میهرەبانیی خۆیت پێ ببەخشێت.

خۆشویستنی هاوڕێ و خزمانیشت، مادەم لە پێناوی خوای گەورەدایە، ئەوا نە جودایی و نە مردنیان ڕێ لەوە ناگرێت بەردەوام برا و هاوڕێت بن و هەمیشە خۆشت بوێن و تێکەڵی‌یان بکـەیت، چونکـە ئـەو پەیوەندی‌یـە "گیـانی" و خۆشەویستی‌یە مەعنەوی‌یە بێ گـەردە، درێـژە دەکێشێت و، بەمەش لەزەتی بەیەك گەیشتنەوە و بەیەك شادبوون هەر بەردەوام دەبێت.. بەڵام ئەگـەر ئـەم خۆشەویسـتی‌یە لەبـەر خـوای گـەورە و لـە پێنـاویدا ئـەودا نـەبێت، ئـەوا لـەزەتی بەیەك‌شادبوونی تەنها ڕۆژێك ئازاری جودایی سەد ڕۆژ بەجێ دەهێڵێت(١).

بەرهەمی خۆشەویستیشت بۆ پێغەمبـەران - درووودیـان لەسـەر بێـت - هـەروەها ئـەولیا و پیاوچاکان، لەوەدایە کە: ئەو جیهانی بەرزەخەی گومڕا و بێ‌ئاگایـان بـە جیـهانێکی تـاریکی بێ هـاودەمیی دادەنێن، تۆ بـە چـەند مەنزڵگایـەکی ڕوونـاکی ئـەوتۆیان دەبینیـت کـە ئـەو پێغەمبەران و پیاوچاکانە ڕووناکیان کردوونەتەوە. ئیتر تۆ لـەوە بێزار نـابیت کـە بڕۆیـت بـۆ لایان و ترست لە جیهانی بەرزەخ نابێت، بەڵکو شەوق و تاسەمەندیی ئـەو جیهانـەی کـە بـەو زاتانە ئاوەدان بووەتەوە دەبێ بە خولیات، بێ ئەوەی ژیانی دنیاشت لـێ تاڵ و لێڵ ببێت..

بەڵام ئەگەر خۆشویستنی ئەوانەت بە چەشنی ئەو خۆشویستنە بێـت کـە مەدەنی‌یـەکان بـۆ مرۆڤـە بەناوبانگـەکان هـەیانـە، ئـەوا تەنـها بیرکـردنەوەت لـە مەسـەلـەی نەمـانی ئـەو ئـەولیا کامـڵانـە و دارزانی ئێسك و پێستیان لە گۆڕستانی هەرە مەزنی ڕابوردوودا، سەبارەت بە تۆ دەبێت بە ئازارێکی زیادی سەرباری ئازارەکانی تری ژیانت و، هـەر ئـەم بیرکردنەوەیـە وا لـە مرۆڤ دەکات مردن و نەمانی خۆیشی بە هـەمان جـۆر ببینێـت و بەوپـەڕی دڵەتەپێ و تـاڵی و

---

(١) بەیەك گەیشتنی برایان بۆ ماوەی یەك چرکە لە پێناوی خوادا، بەساڵێکی تەمەن دادەنرێت. بەڵام ساڵێکی بەیەك گەیشتنێك کە لەبەر دنیای فانی بێت، یەك چرکەش ناهێنێت. (دانەر)

حەسرەتەوە بڵێت: (دەبێ منیش بڕۆمە ئەو گۆڕستانەی ئێسك و پێستی ئەو مرۆڤە مەزنانەی ئاوا دارِزاند).. بەڵام لە ڕوانگەی یەکەمەوە ئەو مەزنانە وا دەبینیت کە دوای ئەوەی پۆشاکی لەشیان لە ڕابوردوودا لەبەر داماڵی، ئێستا لە جیهانی بەرزەخدا – کە هۆڵی پێشوازی کردنە – لە خۆشی و بەختەوەری و حەوانەوەدان. ئیتر بە ڕوانینێکی پڕ لە تاسە و بێ پەژارە و ئازار، تەماشای گۆڕستان دەکەیت.

خۆشەویستیشت بۆ شتە جوان و کاروبارە پاکەکان، مادەم لە پێناوی خوای گەورە و ناسینی بەدیهێنەری مەزنیاندایە و بە ڕادەیەکە هانت دەدات کە بڵێیت: (چەندە جوان بەدی هێنراوە)! ئەم خۆشەویستی‌یە – خۆی لە خۆی‌دا – بیرکردنەوەیەکی بەلەزەتە، جگە لەوەی کە ڕێ لە بەردەم خۆشەویستی و تاسەمەندیی جوانی‌دا والآ دەکات، تاکو بۆ چەندین پلەی تام و چێژی بڵند و بەرز بڕوانێت و لەوێ گەنج و سامانە بەنرخەکانی ئەو گەنجینانەت پیشان دەدات، ئیتر مرۆڤ لەوێ بە کەیف و شادی‌یەکی بەرز سەرنجی ئەو گەنجینانە دەدات، چونکە ئەم خۆشەویستی‌یە چەندین ئاسۆ لە بەردەم "دڵ"دا دەکاتەوە، بۆ ئەوەی ڕوانینی دڵ لە سەیرکردنی شوێنەوارەکانی بەدیهێنەری مەزنەوە بگوێزێتەوە بۆ بینینی جوانیی کاروبارە ناوازەکانی ئەو بەدیهێنەرە و، لە جوانیی کاروبارەکانیەوە بۆ جوانیی ناوەکانی و، لە جوانیی ناوەکانیەوە بۆ جوانیی سیفەتە مەزنەکانی و، لە جوانیی سیفەتە مەزنەکانیەوە بۆ جوانیی زاتی پاك و پیرۆزی ئاراستە بکات. ئەم خۆشەویستی‌یە بەم ڕێگایە، پەرستنێکی بەلەزەتە و لە هەمان کاتیشدا بیرکردنەوەیەکی بەرزی گەلێ بەتامە.

خۆشەویستیشت بۆ "لاوی" مادەم لەبەر ئەوەیە کە نیعمەتێکی جوانی خوای گەورەیە، ئەوا دیارە لە پەرستنی خوادا بەسەری دەبەیت و بە نوقمبوون لە گوناه و نەفامی‌دا ئەو سەردەمەی ژیانت ناکوژیت. چونکە ئەو پەرستنانەی لە تافی لاوی‌دا بە دەستیان دەهێنیت، چەند بەروبوومێکی پێگەیشتووی هەمیشەیین کە ئەو سەردەمە فانی‌یە بەرهەمی هێناون.

جا هەتا لەو قۆناغەی ژیانت دوور بکەویتەوە و بەساڵدا بچیت، پتر بەرهەمی نەبڕاوەی ئەو سەردەمەت دەست دەکەوێت و وردە وردە لە بەڵاکانی دەروونی بەدخواز و گوناهباری‌یەکانی هەڵەشەیی لاوی ڕزگار دەبیت و، لە دەرگانەی خوای گەورەی بە توانادا ئومێدەواری ئەوە دەبیت کە لە پیری‌دا بۆ دەستکەوتنی پەرستنی زیاتر پشتگیری و سەرکەوتووت بکات و، هەرگیز بێزت نایەت وەك ئەو بێ‌ئاگایانە وابیت کە پەنجا ساڵ لە تەمەنی پیریی خۆیان بە خەم و پەشیمانیی نەمانی لەزەت و خۆشیی پێنج و دە ساڵی لاوی‌یان بەسەر دەبەن، ئەو پەشیمانی و خەم و خەفەتەی کە شاعیرێك بەم دێڕە شیعرە دەری بڕیوە کە دەڵێت:

ألا ليتَ الشبابَ يعودُ يوماً فأُخْبِرَهُ بِمَا فَعَلَ الْمَشيبُ(١)

خۆشەویستیشت بۆ دیمەنە جوانەکان، بە تایبەت دیمەنەکانی بەهار، لەبەر ئەوەی لە دیدگای سەیرکردنی سنعەتە جوان و ناوەزەکانی خوای گەورەوەیە، ئەوا تەواوبوون و بەسەرچوونی ئەو بەهارە هەرگیز لەزەتی بینین و سەیرکردنی نافەوتێنێت، بەڵکو واتا رەنگین و قەشەنگەکانی پشت پەردەی ئەو بەهارەی بۆ بەجێ دەهێڵێت، چونکە وەرزی بەهار، وەك نامەیەکی رەنگینی پەروەردگار وایە کە لە رووی بوونەوەراندا دەکرێتەوە. جا هەریەك لە "ئەندێشەی تۆ" و "کات" وەك فلیمی سینەما وان ئەو لەزەتی سەیرکردنەت بە هەمیشەیی و بەردەوامی بۆ دەهێڵنەوە و هەردەم واتاکانی ئەو نامەیەی بەهارت بۆ نوێ دەکەنەوە، کەواتە خۆشەویستی‌یەکەت "کاتی" و "نوقمبوو"ی دەریای خەم و پەژارە نابێت، بەڵکو خۆشەویستی‌یەکی ساف و بێ گەرد و بەتام و لەزەت دەبێت.

خۆشویستنی دنیاشت، لەبەر ئەوەی بۆ خوای گەورە و لە پێناوی ئەودایە، ئەوا بوونەوەرە سامناکەکانی ناوی بۆتۆ دەبن بە هاوڕێ و هاودەم. ئنجا لەبەر ئەوەش دنیات لەو رووەوە خۆش دەوێت کە مەزرای دوارۆژە، ئەوا دەتوانیت لە هەموو شتێکی ناویدا بەرهەمی وای لێ بچنیت کە بشێت بە یەکێك لە بەروبوومەکانی ئاخیرەت دابنرێت، یان شتێکی ئەوتۆی لێ قازانج بکەیت کە ببێت بە سەرمایەیەك بۆ دوارۆژت. کەواتە گیروگرفتەکانی دنیا ناتترسێنن و، نەمان و لەناوچوونیش بێزارت ناکەن.

بەم جۆرە ماوەی مانەوەت لە دنیادا وەك میوانێکی بەرێز بەسەر دەبەیت.

بەڵام ئەگەر خۆشەویستیت بۆ دنیا وەك هی بێئاگایان وا بێت، مانای وایە - وەك چەندین جار پێمان وتویت - لەناو خۆشەویستی‌یەکی بکوژی خنکێنەری لەناوچووی بێ سووددا خۆت نوقم دەکەیت تا لە ئەنجامدا لەناودەچیت!

بەم چەشنە، تێ کۆشاین کە یەك لە سەدانی ئەو سوودە ناسکانە باس بکەین کە دەگەڕێنەوە بۆ خۆشویستنی ئەوانەی باستکردن کاتێ بە ڕێنمایی قورئانی پیرۆز خۆشتبوێن. لە هەمان کاتیشدا ئاماژەمان بۆ یەك لە سەدانی ئەو زیانانە کرد کە ئەگەر ئەو خۆشەویستی‌یە بەپێی فەرمانی قورئانی پیرۆز نەبێت.

**پاشان:**

ئەگەر دەتەوێت ئەنجامەکانی ئەم خۆشەویستی‌یە جۆراوجۆرانە لەودنیا و جیهانی دوارۆژدا بزانیت، وەك ئەوەی کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئاماژەیان بۆ کردووە، ئەوا بە

---

(١) کورد لە واتای ئەم بەیتە شیعرە عەرەبی‌یەدا وتوویەتی:

خۆزگا گەنجی‌یەکەم ئەگەڕا دواوە گلەیی پیریم ئەکرد بەلاوە

کورتی لە نێوان سوودەکانی ئەو خۆشەویستی‌یە جۆراوجۆرە ڕەوایانەدا یەك سوودت بۆ ڕوون دەکەینەوە، ئەمەش لە "نۆ" ئاماژەدا، دوای ئەوەی کە پێشەکی‌یەکی لە پێشدا بۆ باس دەکەین.

**پێشەکی:**

خوای گەورە، بە: خوایەتیی مەزن و، میهرەبانیی جوان و، پەروەردگاریی گەورە و، بەزەیی بەخشندانە و، توانای مەزن و، دانایی نەرمونیانی خۆی، ئەم مرۆڤە بچووکەی بە چەندین هەست و شعووری تابلێی زۆر ئارایشت داوە و، بە ئەندام و ئامێری گەلێ جۆراوجۆری زۆریش ڕازاندوویەتەوە، تاکو وای لێ بکات هەست بە چینەکانی بەزەیی‌یە فراوانەکەی بکات و، جۆرەکانی نیعمەتە لەژمارەبەدەرەکانی خۆی پێ بچێژێت و، بەشە لەبن نەهاتووەکانی چاکەکاری‌یەکانی خۆی پێ بناسێنێت و، لە ڕێی ئەو ئامێر و ئەندامە زۆرانەوە جۆرە بێ‌سنوورەکانی درەوشانەوەی هەزار و یەك ناوی خۆی پێ پیشان بدات و، ئنجا مرۆڤیش بە باشی ڕێزی شایانیان لێ بگرێت.

هەریەك لەو ئەندام و ئامێرە زۆرانەی مرۆڤ، چەندین کار و فرمانی جۆراوجۆر و پەرستنی جیاجیایان هەیە و، لەزەت و ئازار و پاداشتی هەریەکەشیان لەوانی تر جیاوازە.

بۆ نموونە: "چاو" جوانیی وێنەکان و موعجیزاتی توانستی قەشەنگ و جوانی خوای گەورە لە جیهانی بینراو(عالم الشهادة)دا دەبینێت، ئیتر لێرەدا بەو شوکرانەبژێری‌یە کە لە ڕێی سەیرکردنی پڕ لە دەرس و پەندەوە دەری دەبڕێت، کار و فرمانی خۆی بەجێ دەهێنێت. خۆ لەزەتی بینین و ئازاری نەمانی ئەو لەزەتە لە هیچ کەسێك شارراوە نی‌یە، کەواتە پێویست بە پێناساندنی ئەو لەزەت و ئازارە ناکات.

نموونەیەکی تر: "گوێ" هەست بەو نەرمونیانی‌یانەی میهرەبانیی خوای گەورە دەکات کە وان لە جیهانی "بیسراوان"دا، لە ڕێی بیستنی هەموو جۆرە دەنگ و ئاوازە ناسك و خۆشە جیاجیاکانەوە. کەواتە "گوێ" پەرستن و، ئازار و، پاداشتی تایبەتیی خۆی هەیە.

نموونەیەکی تر: هەستی "بۆنکردن" کە هەست بە نەرمونیانی و جوانیی میهرەبانیی خوای گەورە دەکات کە لە بۆنی جۆرەهای جۆری عەتر و بۆی خۆشەوە پەیدا دەبێت. کەواتە ئەویش لە چوارچێوەی شوکرانەبژێریی تایبەتیی خۆی‌دا لەزەتی تایبەتیی هەیە و، بێ هیچ گومانێك پاداشتی تایبەتیشی هەیە.

نموونەیەکی تر: هەستی "چەشتن" کە لە دەمدایە، کار و فرمانی خۆی بەجێ دەهێنێت و شوکرانەبژێریی مەعنەویی خۆی بە چەندەها جۆر ئەنجام دەدات، لە ڕێی هەستکردنیەوە بە تام و چێژ و لەزەتی هەموو جۆرەکانی خواردەمەنی.

به‌م چه‌شنه، هه‌ریه‌ك له‌ ئامێر و هه‌ست و ئه‌ندامه‌كان و، هه‌ریه‌كه‌ش له‌ لایه‌نه‌ ناسكه گرنگه‌كانی مرۆڤ وه‌ك: دڵ و گیان و غه‌یری ئه‌مانه‌ش، فه‌رمانبه‌ریی جیاجیا و له‌زه‌تی جۆراوجۆری تایبه‌تیی خۆیان هه‌یه، بێ هیچ گومانێكیش ئه‌و خواوه‌نده‌ی كه‌ ئه‌م هه‌موو ئامێرانه‌ی له‌و فه‌رمانبه‌ری‌یانه‌دا خستووه‌ته‌كار، پاداشتی گونجاو و شیاوی هه‌ریه‌كه‌شیان ده‌داته‌وه.

ئه‌نجامه‌ دنیایی و زۆره‌كانی ئه‌و جۆره‌ جیاجیایانه‌ی خۆشه‌ویستیش - كه‌ باس كران - هه‌موو مرۆڤێك له‌ خۆی‌دا هه‌ستی پێ ده‌كات و، به‌ چه‌شنێكی بێ‌گومان و ڕاست، دڵنیایه‌ له‌م هه‌ستكردنه‌ی خۆی.

ئه‌نجامه‌كانی سه‌ر به‌ دواڕۆژیشیان، "دوازده" ڕاستیی دره‌خشانی په‌یامی "حه‌شر" و "شه‌ش" بنچینه‌ی ڕوونی په‌یامی "مه‌لائیكه‌ت" چه‌سپاندوویانه.

ڕوونكردنه‌وه‌ی دووردرێژی ئه‌م ئه‌نجامانه‌ش، به‌ جۆرێكی گومان‌بڕ و به‌ ده‌قی قورئانی پیرۆز چه‌سپاوه، كه‌ ڕاست‌ترین گوفتار و ڕه‌وانترین ڕێسایه‌ و گوفتاری خواوه‌ندی پادشای به‌ده‌سته‌ڵاتی به‌ هه‌موو شت ئاگایه. چونكه‌ ئایه‌ته‌كانی قورئانی پیرۆز چ به‌ ڕاسته‌وخۆ و ڕاشكاوی و چ به‌ ئاماژه‌ و هێما، ئه‌مه‌یان چه‌سپاندووه. له‌به‌ر ئه‌وه، به‌ پێویستی نازانین به‌ڵگه‌ی دوور و درێژ له‌م ڕووه‌وه‌ بهێنینه‌وه، ده‌بێ ئه‌وه‌ش بزانین كه‌ له‌ چه‌ند "وته"یه‌كی تر و له‌ مه‌قامی دووهه‌می عه‌ره‌بیی په‌یامی "به‌هه‌شت"دا، كه‌ وته‌ی بیست و هه‌شته‌مه‌ و، له‌ په‌یامی "مه‌لائیكه‌ت"دا، كه‌ وته‌ی بیست و نۆهه‌مه، به‌ڵگه‌ی گه‌لێ زۆر و زه‌به‌نده‌مان له‌سه‌ر هێناوه‌ته‌وه.

❖ **ئاماژه‌ی یه‌كه‌م:**

ئه‌نجامی "دواڕۆژ" بۆ خۆشویستنی ڕه‌وا و هاوده‌می شوكرانه‌بژێریی: خوارده‌مه‌نی و میوه خۆش و به‌له‌زه‌ته‌كانی دنیا، ئه‌و خوارده‌مه‌نی و میوه به‌له‌زه‌تانه‌یه‌ كه‌ شایانی به‌هه‌شتی هه‌میشه‌یین، وه‌ك ده‌قی قورئانی پیرۆز ڕایده‌گه‌یه‌نێت. ئه‌م خۆشه‌ویستی‌یه‌ - له‌ ڕاستی‌دا - خۆشه‌ویستی‌یه‌كی پڕ حه‌ز و تاسه‌یه‌ بۆ به‌هه‌شت و میوه‌كانی، به‌ ڕاده‌یه‌ك ئه‌و میوه‌یه‌ی له‌م دنیایه‌دا ده‌یخۆیت و "الحمد لله"ی له‌سه‌ر ده‌كه‌یت، له‌ به‌هه‌شتدا ده‌بێت به‌ میوه‌یه‌كی به‌رجه‌سته‌ی خاوێن و پێشكه‌شت ده‌كرێت. كه‌واته‌ تۆ لێره‌ "میوه" ده‌خۆیت و له‌وێیش "الحمد لله" ده‌خۆیت له‌ شێوه‌ی میوه‌یه‌كی به‌رجه‌سته‌ی به‌هه‌شتدا! جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خوارده‌مه‌نی و میوه‌كان كه‌ لێره‌ ده‌یانخۆیت نیعمه‌ت به‌خشین و ئاوڕدانه‌وه‌ی په‌روه‌ردگاری‌یانه‌یان تێدا ده‌بینیت و به‌م كاره‌شت شوكرانه‌بژێریی مه‌عنه‌وی‌یان له‌سه‌ر پێشكه‌ش ده‌كه‌یت، ئه‌وا له‌ به‌هه‌شتدا بۆت ده‌بن به‌ خوارده‌مه‌نی و میوه‌ی خۆش و

پێشکەشت دەکرێن، وەك بە دەقی فەرموودەی پیرۆز و ئاماژەکانی قورئان چەسپاوە و، دانایی و میهرەبانیی فراوانی خوای گەورەش داخوازیەتی.

❖ **ئاماژەی دووهەم:**

خۆشویستنی ڕەوای "نەفس"(دەرون) واتە: خۆشویستنی لە دنیادا لەسەر بناغەی: بینینی کەموکووڕییەکانی نەك چاکییەکانی و، هەوڵدانی پێگەیاندن و چاودێری و پاکژکردنی بە شەفەقەت و میهرەبانی و، هاندانی بۆ ڕێی خێر و چاکە.. ئەنجامی ئەو خۆشەویستییە کە بەم چەشنە بێت، ئەوەیە کە بەدیهێنەری مەزن لەودنیادا چەندین خۆش ویستراوی ئەوتۆی پێ دەبەخشێت کە شایانی ئەو نەفسە و بەهەشت بێت.

چونکە ئەو "نەفس"ەی لە دنیادا لە پێناوی خوای گەورە وازی لە هەوا و ئارەزووی خۆی هێناوە و، ئەندام و ئامێرە جۆراوجۆرەکانیشی بە باشترین و تەواوترین شێوە بەکار هێناوە، خواوەندی بەدیهێنەری بەخشندەش لە پاداشتی ئەو خۆشەویستییە ڕەوا و ئاوێتەی خواپەرستییەدا، بە "حور العين" پاداشتی دەداتەوە کە لە حەفتا چەشنی پۆشاکی بەهەشتدا خۆیان دەنوێنن، ئەو بەهەشتەی کە دارای چەندین جۆری جوانی و ناسکی و نەرمونیانییە و، ئەو حۆرییانەش کە خاوەنی حەفتا جۆری جوانین، بە ڕادەیەك کە دەڵێی خۆیان بەهەشتێکی بەرجەستەی بچووکن و گیانیان بە بەردا کراوە تاکو چاوی ئەو "نەفس"ەی پێ بگەشێتەوە کە گوێڕایەڵیی خوای گەورەی کردووە و، ئەو هەستانەشی پێ بسرەوێت کە ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورە بوون.. ئەم ئەنجامە هیچ گومانێکی تێدا نییە، چونکە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بە دڵنیایی دانی پێدا دەنێن.

پاشان ئەنجامی خۆشەویستیی "لاوی"، واتە ئەنجامی بەکارهێنانی هێز و هەرەتی تافی لاوی لە پەرستن و تەقوادا: لاوییەکی هەمیشەییە لە خانەی مانەوە و نیعمەتی بەردەوامی بەهەشتدا.

❖ **ئاماژەی سێهەم:**

ئەنجامی دوارۆژیش بۆ "خۆشەویستیی هاوسەری ژیان" کە لەسەر بناغەی ڕەوشت جوانی و شەفەقەتە نەرمونیانەکەی خۆشت بوێت، ئەو خۆشەویستییەی کە لە سەرپێچی و گوناهباری بیپارێزێت، ئەنجامی ئەم خۆشەویستییە ئەوەیە کە ئەو هاوسەرە باشە لە بەهەشتدا دەبێت بە خۆشەویست و هاوڕێی ڕاست و هاودەمی دڵدەرەوەی مرۆڤ و، جوانی و قەشەنگی و ڕازاوەیی ئەو لە بەهەشتدا گەلێ لە هی "حور العين" دڵگیرتر و قەشەنگتر دەبێت و، لەگەڵ مێردەکەیدا بە خۆشی و کامەرانی دەدوێن و ڕووداوەکانی ڕۆژگارانی پێشوویان یاد دەکەنەوە.. خواوەندی میهرەبانی بەخشندە ئاوا بەڵێنی داوە، خۆ مادەم بەڵێنی داوە، دەیشیباتەسەر.

❖ ئاماژه‌ی چوارەم:

ئه‌نجامی خۆشه‌ویستیی "دایك و باوك و منال"یش ئه‌وه‌یه‌ كه‌: هه‌رچه‌نده‌ ئه‌و خێزانه‌ به‌خته‌وه‌ره‌ پله‌كانی به‌هه‌شتیان له‌ یه‌كتر جیاوازه‌، به‌ڵام خوای گه‌وره‌ی به‌خشنده‌ی میهره‌بان چاكه‌یان له‌گه‌ڵ ده‌كات و به‌ یه‌كتریان شاد ده‌كاته‌وه‌، ئه‌وانیش له‌گه‌ڵ یه‌كتر داده‌نیشن و گفتوگۆ ده‌كه‌ن به‌ چه‌شنێك كه‌ شیاوی به‌هه‌شت و خانه‌ و لانه‌ی هه‌میشه‌یی بێت، وه‌ك به‌ ده‌قی قورئان ئه‌مه‌ چه‌سپاوه‌. هه‌روه‌ها ئه‌و منالانه‌ش كه‌ پێش بالغ بوونیان له‌ دنیا كۆچیان كردووه‌، خواوه‌ند نیعمه‌تی یاری و گه‌مه‌ و گاڵته‌كردن له‌گه‌ڵیاندا به‌ باوك و دایكانیان ده‌به‌خشێت و، ئه‌و منالانه‌یان بۆ ده‌كات به‌ منالی هه‌میشه‌یی(ولدان مخلدون) له‌ جوانترین و خۆشه‌ویسترین شێوه‌دا كه‌ حه‌زی پێ بكه‌ن. به‌مه‌ش ئاره‌زووی گه‌مه‌ و گاڵته‌كردن له‌گه‌ڵ منالدا، كه‌ له‌ ناخی سروشتی مرۆڤدا ڕه‌گی داكوتاوه‌، دابین ده‌بێت. ئیتر تام و له‌زه‌تێكی هه‌میشه‌یی و به‌رده‌وامی له‌ به‌هه‌شتدا لێ ده‌چێژن، چونكه‌ ئه‌و منالە بچووكانه‌ی كه‌ نه‌گه‌یشتوونه‌ته‌ ته‌مه‌نێك هیچ ته‌كلیفێكیان لێ بكرێت، به‌ نه‌مری و هه‌میشه‌یی له‌گه‌ڵیاندا ده‌مێننه‌وه‌.

زووتر وا گومان ده‌برا كه‌ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له‌ به‌هه‌شتدا زاوزێ نی‌یه‌، ئه‌وا یاری و گاڵته‌ و گه‌پیشی له‌گه‌ڵ منالدا تێدا نی‌یه‌! به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ به‌هه‌شت باشترین له‌زه‌ته‌كانی دنیای تێدایه‌، ئه‌وا ده‌بێ یاری و گاڵته‌ و گه‌پیشی له‌گه‌ڵ منالدا - به‌ باشترین و جوانترین شكڵ و شێوه‌ - تێدا بێت. كه‌واته‌ مژده‌بێت له‌و باوك و دایكانه‌ی كه‌ له‌ دنیادا جگه‌رگۆشه‌ و كۆرپه‌كانیان كۆچیان كردووه‌!

❖ ئاماژه‌ی پێنجەم:

ئه‌نجامی خۆشه‌ویستیشت بۆ هاوڕێ و خزمه‌ باشه‌كانت كه‌ به‌ داخوازیی: "الحب في الله" خۆشت ده‌وێن، له‌وه‌دایه‌ كه‌ له‌ودنیادا به‌رامبه‌ر یه‌كتری داده‌نیشن و یادداشته‌كانی زووتری ڕۆژانی دنیا و یاده‌ جوانه‌كانتان بۆ یه‌كتر ده‌گێڕنه‌وه‌ و، كاتێكی خۆش و شاد به‌م چه‌شنه‌ گفتوگۆ و دانیشتنه‌ به‌سه‌ر ده‌به‌ن، وه‌ك به‌ ده‌قی قورئانی پیرۆز چه‌سپاوه‌.

❖ ئاماژه‌ی شه‌شه‌م:

ئه‌نجامی خۆشویستنی پێغه‌مبه‌ران - درووردیان له‌سه‌ر بێت - و ئه‌ولیا و پیاوچاكانیش، وه‌ك قورئانی پیرۆز ڕوونی ده‌كاته‌وه‌، ئه‌وه‌یه‌ كه‌: شه‌فاعه‌تی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ به‌ڕێز و ئه‌ولیا و پیاوچاكانه‌ت له‌ جیهانی به‌رزه‌خ و حه‌شری مه‌زندا ده‌ست ده‌كه‌وێت، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه‌ تۆ به‌م خۆشه‌ویستی‌یه‌ت له‌ ڕێژنه‌ی پله‌ به‌رز و شیاوه‌كانی ئه‌وانه‌وه‌ سوودمه‌ند و به‌هره‌وه‌ر ده‌بیت.

بەڵێ، دەقی فەرموودەی پیرۆز ڕایدەگەیەنێت کە: "المرء مع من أحب"[(١)]. کەواتە مرۆڤ دەتوانێت بە پەیوەندیی خۆشەویستی و شوێنکەوتنی خۆشەویستەکەی، بگات بە بڵندترین پلەی ئەو خۆشەویست و هاوەڵەی خۆی.

❖ **ئاماژەی حەوتەم:**

خۆشویستنی شتە جوانەکان و بەهاریش، واتە بۆڕوانینیان لەو ڕوانگەیەوە کە دەڵێت: (چەندە جوان دروست کراوە) و، ئاراستە کردنی ئەو خۆشەویستییەت بۆ ئەو جوانییانەی وان لە پشتی ئەو شتە جوانەوە، بۆ: جوانیی کردار و ڕێکوپێکییان و بۆ جوانیی درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورە کە لە پشتی ئەو کردارانەوەن و، بۆ درەوشانەوەی سیفەتە مەزنەکان کە لە پشتی ئەو ناوە جوانانەوەن... هتد بەم پێیە تا دەڕوات.. ئەنجامی ئەم خۆشویستنە ڕەوایە:

بینینی جوانییەکی ئەوتۆیە کە هەزاران ئەوەندەی ئەو جوانییە بڵندەی کە لە بەدیهێنراواندا بینیت بەرز و باڵاترە. واتە بینینی درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورە و جوانیی سیفەتە مەزنەکانیەتی، بە چەشنێك شیاوی بەهەشت بێت. ئەمەش لە ڕادەیەکی وادایە کە ئیمامی ڕەببانی - خوا لێی ڕازی بێت - فەرموویەتی: (جوانی و نەرمی و ناسکییەکانی بەهەشت، لە ڕاستیدا، وێنە و تیشکدانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەن). ئنجا تۆیش فەرموو بیری لێ بکەرەوە!

❖ **ئاماژەی هەشتەم:**

خۆشەویستیی ڕەوا و شیاوت بۆ دنیا، واتە گەر دنیات لەگەڵ بیرکردنەوەدا لە دوو ڕووە جوانەکەی خۆش بوێت کە بریتین لەوەی "کێڵگەی دواڕۆژە" و "ئاوێنەی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەیە"، ئەنجامی دواڕۆژی ئەم خۆشەویستییە ئەوەیە کە:

لەودنیادا بەهەشتێکی ئەوەندە فراوانت پێ دەبەخشرێت کە جێی هەموو ئەم دنیایەی تێدا دەبێتەوە، بەڵام وەکو ئەم دنیا نییە، واتە لەناو ناچێت، بەڵکو هەمیشەیی و بەردەوامە. ئنجا لە ئاوێنەکانی ئەو بەهەشتەدا درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەشت - کە لە دنیادا هەندێکت لە سێبەرە لاوازەکانی بینی - بە ڕەنگینترین درەخشانی و جوانی پیشان دەدرێن.

پاشان خۆشەویستیی دنیا لەو ڕووەوە کە "کێڵگەی ئەودنیایە" واتە بەو حسابەی کە دنیا شەتڵگایەکی گەلێ بچووکە بۆ چاندنی ئەو تۆوانەی لە دواڕۆژدا بەر دەگرن، ئەنجامی ئەم خۆشویستنەی کە لەم ڕووەوەیە:

---

(١) رواه البخاري، كتاب الأدب.

میوه و به‌روبوومی به‌هه‌شتێكه كه جێی هه‌موو دنیای تێدا ده‌بێته‌وه، چونكه سه‌رجه‌می ئه‌و هه‌ست و شعوورانه‌ی كه له دنیادا بۆ مرۆڤ وه‌كو تۆوی بچووك وابوون، له‌و به‌هه‌شته‌دا هه‌موویان به ته‌واوی ده‌پشكوێت و سه‌ر ده‌رده‌هێنن و، تۆوه بچووكه‌كانی توانا و لێهاتن و ئاماده‌یی‌یه سروشتی‌یه‌كانی ناخی مرۆڤیش له‌وێ وه‌ك گوڵه‌گه‌نم ده‌میان به گوڵ ده‌كه‌نه‌وه و هه‌موو جۆره‌كانی له‌زه‌ت و كه‌مالات له‌گه‌ڵ خۆیان هه‌ڵده‌گرن. ئه‌م ئه‌نجامه به‌پێی داخوازیی میهره‌بانیی فراوان و دانایی ڕه‌های خوای گه‌وره، ئه‌نجامێكی ڕه‌وا و سه‌لمێنراوه، جگه له‌وه‌ش كه به ده‌قی فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و ئاماژه‌كانی قورئانی پیرۆزیش چه‌سپاوه.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی تۆ دنیات له‌به‌ر ئه‌و ڕووه چه‌په‌ڵ و خراپه‌ی خۆش نه‌ویستووه كه سه‌رچاوه‌ی هه‌موو تاوانێكه، به‌ڵكو خۆشه‌ویستی‌یه‌كه‌ت ئاراسته‌ی دوو ڕووه‌كه‌ی تری كردووه، واته ئه‌و خۆشه‌ویستی‌یه‌ت بۆ دنیا ڕووی له "ناوه جوانه‌كانی خوا" و "دوارۆژ"ه و له پێناوی ئه‌م دوو ڕووه‌ی‌دا په‌یوه‌ندیت له‌گه‌ڵدا به‌ستووه و، به نیازی خواپه‌رستی ئه‌و دوو ڕووه‌ی ئه‌وت ئاوه‌دان كردووه‌ته‌وه، كه ئه‌مه‌ش له ڕاده‌یه‌كدایه وه‌ك ئه‌وه‌ی پڕ به هه‌موو دنیا خواپه‌رستیت كردبێت.. ئه‌وا بزانه ئه‌و پاداشته‌ی كه له‌م خۆشه‌ویستی‌یه‌وه ده‌ستت ده‌كه‌وێت ده‌بێ له‌م دنیایه گه‌لێ فراوانتر بێت. ئه‌مه‌ش شتێكه میهره‌بانی و دانایی خوای گه‌وره داخوازیه‌تی.

پاشان مادەم ئه‌م خۆشه‌ویستی‌یه‌ت له‌به‌ر خۆشه‌ویستیی قیامه‌ت بووه و دنیات كردووه به كێڵگه‌یه‌ك بۆ دوارۆژ و، خوای گه‌وره‌ت له‌گه‌ڵدا خۆش ویستووه و دنیات به ئاوێنه‌یه‌ك زانیوه بۆ پیشاندانی ناوه جوانه‌كانی، ئه‌وا بێ هیچ گومانێك ده‌بێ له به‌رامبه‌ر و له پاداشتی ئه‌م خۆشه‌ویستی‌یه‌دا، خۆش ویستراوێك دابنرێت كه له‌م دنیایه فراوانتر بێت. دیاره ئه‌و پاداشته جگه له‌و به‌هه‌شته‌ی كه له ئاسمانه‌كان و زه‌وی فراوانتره، هیچی تر نی‌یه.

**پرسیار:** چ سوودێك هه‌یه له‌و به‌هه‌شته‌دا كه به ئه‌ندازه‌ی دنیا فراوان بێت؟

**وه‌ڵام:** ئه‌گه‌ر بتوانیت به خێرایی ئه‌ندێشه به هه‌موو هه‌رێم و لایه‌كی گۆی زه‌وی‌دا بڕۆیت و، پاشان سه‌ر له زۆربه‌ی ئه‌ستێره‌كانی ئاسمان بده‌یت، ئه‌وا ده‌ڵێیت: (هه‌موو جیهان هی منه). ئه‌م بڕیاره‌شت ڕێ له بوونی مه‌لائیكه‌ت و خه‌ڵكانی تر و زینده‌وه‌ران ناگرێت كه له‌م جیهانه فراوانه‌دا له‌گه‌ڵتدان.. به هه‌مان جۆر ده‌توانیت بڵێیت: (ئه‌و به‌هه‌شته هی منه) با پڕیش بێت له كه‌سانی تر كه ده‌چنه ناویه‌وه.

له په‌یامی "به‌هه‌شت"دا كه وته‌ی بیست و هه‌شته‌مه، هه‌روه‌ها له په‌یامی "ئیخلاس"دا ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌مان ڕوون كردووه‌ته‌وه كه ده‌فه‌رموێ: (به‌هه‌شتی هه‌ندێ كه‌س فراوانی‌یه‌كه‌ی پێنج‌سه‌د ساڵه).

❖ ئاماژەی نۆهەم:

ئەنجامی ئیمان بوون بە خوای گەورە و خۆشویستنی:

بینینی جوانیی خاوێن و کەماڵی بەرز و پاکی زاتی مەزنی خوای گەورەیە، وەك بە فەرموودەی "صەحیح" چەسپاوە[١]. سەعاتێکی ئەم بینینە هەزار هەزار ساڵی نیعمەتەکانی تری بەهەشت دەهێنێت[٢]، کە سەعاتێکی ئەو نیعمەتانەی بەهەشتیش هەزار هەزار ساڵی خۆش گوزەرانیی دنیا دەهێنێت، وەك بە یەکدەنگی لای زانایان و ئەهلی کەشف چەسپاوە.

بەم نموونەی خوارەوە دەتوانیت ڕادەی ئەو شەوق و تاسەمەندی و ئارەزووە تونـد و بەتینە لێك بدەیتەوە کە بۆ بینینی ئەو جوانییە خاوێن و کەماڵە بەرز و پاکە لە سروشتی مرۆڤدا قوڵپ دەدات و لە جۆش و خرۆشدایە:

هەموو مرۆڤێك لە هەست و دەروونی خۆیدا حەزێکی بەتینی تێدایە بۆ بینینی حەزرەتی سلێمان - دروودی خوای لەسەر بێت - کە "کەماڵ"ی پێ بەخشرا بوو.. هەروەها هەستیش بە تاسەمەندییەکی گەرموگوڕ دەکات بۆ بینینی حەزرەتی یووسف - دروودی خوای لەسەر بێت - کە بەشێکی "جوانی"ی پێ سپێررابوو..

ئایا دەبێ حەز و ئارەزوومەندیی مرۆڤ چەندە بێت بۆ بینینی "جوانی"یەکی خاوێن و "کەماڵ"ێکی بەرز و پاك، کە بەهەشتی هەمیشەیی بە هەموو جوانـی و نیعمـەت و کەماڵاتێکیەوە، کە چەندەها جاری لەژمارەبەدەر لە "جوانی" و "کەماڵ"ی دنیا بەرزترە، یەکێکە لە درەوشانەوەکانی ئەو جوانی و کەماڵە؟

اللهم ارزقنا في الدنيا حبّك وحبّ ما يقربنا إليك، والإستقامة كما أمرت، وفي الآخرة رحمتك ورؤيتك.

﴿سبحانك لا علم لنا إلاّ ما علّمتنا إنك أنت العليم الحكيم﴾.

اللهم صلّ وسلّم على من أرسلته رحمةً للعالمين، وعلى آله وصحبه أجمعين. آمين.

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه أن ناساً قالوا: يا رسول الله هل نرى ربنا يوم القيامة؟ فقال رسول الله ﷺ: هل تضارون في رؤية القمر ليلة البدر؟ قالوا: لا يا رسول الله. قال: هل تضارون في الشمس ليس دونها سحاب؟ قالوا : لا. قال: فإنكم ترونه كذا. فەرموودەکە بە درێژی ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

(٢) لە دەقی حەدیثدا هاتووە کە دەفەرموێ: "...قال: فيكشف الله تبارك وتعالى تلك الحجب، ويتجلى لهم، فيغشاهم من نوره شيء لولا أنه قضى عليهم أن لا يحترقوا لاحترقوا مما غشيهم من نوره. قال: ثم يقال لهم ارجعوا إلى منازلكم. قال فيرجعون إلى منازلهم وقد خفوا على أزواجهم وخفين عليهم مما غشيهم من نوره تبارك وتعالى. فاذا صاروا إلى منازلهم تراد النور وأمكن حتى يرجعوا إلى صورهم التي كانوا عليها. قال فتقول لهم أزواجهم: لقد خرجتم من عندنا على صورة، ورجعتم على غيرها؟ قال: فيقولون: ذلك بأن الله تبارك وتعالى تجلى لنا فنظرنا منه ما خفينا به عليكم..."(رواه البزار- بڕوانە: الترغيب والترهيب للمنذري ج٤/ص ٥٥٦-دانەر).

## بێدارکردنەوەیەك:

درێژەپێدان و ڕوونکردنەوەکانی کۆتـایی ئـەم وتەیـە، بـە دوور و درێژ دانانرێن، چونکە هێشتا لـە چاو بایـەخ و گرنگییـاندا کورتـن و پێویستیان بە درێژەپێدانی زیاترە.

ئنجا قسەکەریش لـە سەرانسەری "وتەکان"دا من نیم، بەڵکو تەنها "حەقیقـەت"ە کـە بـە نـاوی "ئاماژەکـانی قورئـان"ەوە لـەو وتانـەدا دەدوێت، خۆ هەر شتێکیش "حەقیقەت" بیڵێت ڕاستە و گومانی تێـدا نییە!

لەبەر ئەوە، ئەگەر هەر هەڵەیەکتان لـە "وتـەکان"دا بینـی، ئـەوا دڵنیا بن کە "بیر"ی خۆم تێکەڵی باسەکە بووە و، بە بێ ویستی خـۆم بە هەڵەدا چووە!

# موناجاتێك

یارەب!

گەر مرۆڤ دەرگای کۆشك و تەلارێکی بۆ نەکرێتەوە، ناچارە بە زایەڵەی دەنگی کەسێك لەو دەرگایە بدات کە دەنگی بە گوێی دەرگاوان ئاشنا و ناسراو بێت.

بۆیە منی لاواز و هەژاریش بە موناجات و لاڵانەوەی بەندە خۆشەویستەکەی خۆت: "وەیسی قەرەنی" لە دەرگای میهرەبانیی تۆ دەدەم، بەو هیوایەی کە هەروەك ئەو دەرگایەت لەو کردەوە لە منیشی بکەیتەوە.. بۆیە دەڵێم:

**إلهي! أنت ربـــي وأنا العبد..**
**وأنت الخالق وأنا المخلوق..**
**وأنت الرّزاق وأنا المرزوق..**
**وأنت المالك وأنا المملوك..**
**وأنت العزيز وأنا الذليل..**
**وأنت الغني وأنا الفقير..**
**وأنت الحي وأنا الميت..**
**وأنت الباقي وأنا الفانـــي..**
**وأنت الكريم وأنا اللئيم..**
**وأنت المحسن وأنا المسئ..**
**وأنت الغفور وأنا المذنب..**
**وأنت العظيم وأنا الحقير..**
**وأنت القوي وأنا الضعيف..**
**وأنت المعطي وأنا السائل..**
**وأنت الأمين وأنا الخائف..**
**وأنت الجواد وأنا المسكين..**
**وأنت المجيب وأنا الداعي..**
**وأنت الشافي وأنا المريض..**

**فاغفِرْ لي ذنوبـــي، وتجاوزْ عني، واشفِ أمراضي، يا اللهُ يا كافي يا رب يا وافـــي يا رحيـــمُ يا شافي يا كريمُ يا معافي. فاعفُ عني من كل ذنبٍ وعافني من كـــل داءٍ وارضَ عـــني أبـــداً برحـــمتك يا أرحم الراحـــمين.**

**﴿وآخِرُ دَعْواهُم أَنِ الحمدُ للهِ رَبِّ الْعالمين﴾.**

# وتەی سی و سێهەم

**بریتی‌یە لـە سی و سێ پەنجەرە**

**(ئەم وتەیە لـە لایەکەوە مەکتووبی سی و سێهەم و، لـە لایەکی تریشەوە وتەی سی و سێهەمە) – دانەر**

**تێبینی**: لەبەر قەبارە گەورەیی ئەم چاپە کوردی‌یەی کۆمەڵە پەیامی **(وتەکان)** ناچار بووین وتەی سی و سێهەم تەنها لە شوێنی دووهەمی خۆی‌دا، کە بەرگی دووهەم و کۆمەڵە پەیامی **(مەکتووبات)**ە بڵاو بکەینەوە. تکایە با خوێنەری بەڕێز ئاگادار بێت – وەرگێڕ

* * *

# چەند بریسکانەوەیەك

## لـە نێوان هەردوو مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان و جەژندا

**تێبینی**: لەبەر قەبارە گەورەیی ئەم چاپە کوردی‌یەی کۆمەڵە پەیامی **(وتەکان)** ناچار بووین پەیامی (**چەند بریسکانەوەیەك**) تەنها لە شوێنی دووهەمی خۆی‌دا (بریسکەی سی و دووهەمی بەرگی سێهەم) واتە: لە کۆمەڵە پەیامی **(بریسکەکان)**دا بڵاو بکەینەوە. تکایە با خوێنەری بەڕێز ئاگادار بێت – وەرگێڕ

بسم الله الرحمن الرحيم

يا الله، يا رحمن، يارحيم، يا فرد، يا حي، يا قيوم، يا حكم، يا عدل، يا قدوس!

تو حەققی ئیسمی ئەعزەم و حورمەتی قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیان و ڕێزی پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ : هەموو ئەو کەسانەی کە ئەم کۆمەڵە پەیامەیان بە چاپ گەیاندووە و یارمەتیدەرە بەڕێزەکانیشیان بە بەهەشتی فیردەوس و بەختەوەریی هەمیشەیی شاد بفەرموو. ئامین.. هەمیشە و بەردەوام لە خزمەتی ئیمان و قورئاندا تەوفیقیان بدە. ئامین.. لە بەرامبەر هەر پیتێکی کتێبی (وتەکان)ەوە هەزار کردەوەی چاك لە لاپەڕەی کردەوە چاکەکانیاندا بنووسە. ئامین.. بە فەزڵ و میهرەبانیی خۆت دامەزراوی و بەردەوامییان لە بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نووردا پێ ببەخشە. ئامین..

یا أرحم الراحمین! سەرجەمی قوتابییانی پەیامەکانی نوور لە هەردوو دنیادا بەختەوەر بفەرموو. ئامین.. لە شەڕی شەیتانەکانی ئینس و جینی بیانپارێزە. ئامین..

لە قسوور و گوناهەکانی ئەم "سەعید"ە دەستەوسان و بێچارەیەش خۆش بە. ئامین.

بە ناوی هەموو قوتابییانی نوورەوە:

سەعیدی نوورسی

## پوختەی چەند لایەنێکی ژیانی دانەر:
## مامۆستا بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی(١)

★ لە نێوان چیا بڵندەکان و لە بەرەبەیانی یەکێك لە ڕۆژەکانی ساڵی (١٢٩٤ك - ١٨٧٦ز) لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگەی "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی "بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نوورسی" لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.

★ "صۆفی میرزا"ی باوکی بە خواپەرستی و پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبوو بێت دەرخواردی مناڵەکانی نەداوە.. خاتوو "نووریە"ی دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبوو بێت شیری بە مناڵەکانی نەداوە!

★ هەر لە قۆناغی مناڵی‌یەوە هەڵکەوتوویی و زیرەکیی پێوە دیار بووە و، لای زانا بەناوبانگەکانی ژینگە و سەردەمی خۆی زانستە ئیسلامی‌یەکانی خوێندووە و، بەشێکی زۆری کاتەکانی بە تاوتوێ کردن و لێکۆڵینەوەی دیاردەکانی دەوروبەری بەسەر بردووە و، لەگەڵ زانایاندا کەوتووەتە وتو وێژ و گفتوگۆی زانستی‌یەوە. تا لە تەمەنی چواردە ساڵی‌دا بڕوانامەی "زانایی"ی وەرگرتووە!

★ هەر لە تافی لاوی و لە خەونێکی ڕاستدا بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ شەرەفمەند بووە و داوای (زانستی قورئان)ی لێ کردووە، حەزرەتیش لەو خەونەدا مژدەی داوەتێ کە: "سیوهبُ لك علمُ القرآن ما لم تسألْ شيئاً من الأمة"! واتە زانستی قورئانت پێ دەبەخشرێت بە مەرجێك " سوئال"ی هیچ شتێك لە نەتەوەکەم نەکەیت. ئەویش تا لە ژیاندا ما سوئالی لە کەس نەکرد، نە بە واتای "پرسیار" و نە بە واتای "سواڵکردن" تەنانەت لە موحتاجترینی کاتەکانی تەمەنی‌دا دیاری و سەدەقە و زەکاتیشی لە خەڵکی وەرنەگرتووە!

★ زیرەکی و زەین ڕۆشنی و توانای لەبەرکردنی هێندە کەم وێنە و لەڕادەبەدەر بووە کە توانیویەتی نزیکەی "نەوەد" کتێبی مەتنە سەرەکی‌یەکان لەبەر بکات، لە بابەتەکانی: (نەحوو، صەرف، تەفسیر، حەدیث، مەنتیق، فیقهی ئیسلامی ... هتد). جگە لەمانەش هەر لە

(١) لەبەر ئەوەی بەرگێکی گەورەی ئەم زنجیرەیە ژیانی دانەری بە پێنووسی مامۆستا نوورسی خۆی و قوتابی‌یانی بە تێروتەسەلی لەخۆ گرتووە، ئەوا لەم بەرگەی ئێستادا تەنها ئەم چەند لاپەڕەیەی ژیانی وەك بەرکوتێك دەخەینە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێز، بەو هیوایەی ئەم لاپەڕانە بخوێننەوە هەتا بەرگی تایبەتیی ژیانەکەی دەردەچێت.

سەرەتای فەرهەنگی بەناوبانگی "القاموس المحیط"وە تا دەگاتە "باب السین"ی ئەو فەرهەنگەی لەبەر کردووە کە کۆی لاپەڕەکانی دەکاتە: (٧٠٨) لاپەڕەی (١٩×١٢سم)، ئنجا بە ماوەی یەك حەفتەش کتێبی "جمع الجوامع"ی سەر بە زانستی ئوصولی فیقهی خوێندووە و لەبەریشی کردووە!

★ بۆ مەبەستی موتالاکردن و خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی پێویستی بوون سوودی لە کتێبخانە پڕ لە کتێبەکانی "عمر پاشا"ی والیی "وان" و "تایەر پاشا"ی والیی "بەدلیس" وەرگرتووە کە ڕێزی زۆریان لێ ناوە و بایەخیان پێ داوە.

★ لە ئەنجامی مونازەرە و وتو ویژی لەگەڵ هەندێ مامۆستای زانستە نوێکانی سەردەمدا هەستی کردووە کە پێوستیی بەو زانستانە هەیە، بۆیە لە شاری "وان" دەستی بە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی کتێبەکانی ئەو زانستانە کردووە، وەك: (بیرکاری، گەردوونناسی، کیمیا، فیزیا، زەوی ناسی، فەلسەفە، مێژوو، جوگرافیا... هتد" تەنانەت توانیویەتی لە هەندێکیشیاندا کتێب دابنێت!

★ لەبەر ئەم زیرەکی‌یە بێوێنەیەی، ناوبانگی بە: (**سەعیدی مەشهوور**) و پاشان بە: (**بەدیعوززەمان**) بڵاو بووەتەوە.

★ لە ساڵی ١٨٩٧زدا مامۆستا "بەدیعوززەمان" ئەو هەواڵەی لە ڕۆژنامە ناوخۆیی‌یەکاندا خوێندەوە کە: "گلادستۆن"ی وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیا لە پەرلەمانی وڵاتەکەیدا نوسخەیەکی قورئانی پیرۆزی بە دەستەوە گرتووە و بە ئەندامانی پەرلەمانی وتووە:

(هەتا ئەم قورئانە لەناو موسڵماناندا بمێنێت ئێمە ناتوانین حوکمڕانی‌یان بکەین، کەواتە چار تەنها ئەوەیە کە قورئان لەسەر زەوی‌دا نەهێڵین، یاخود پەیوەندیی موسڵمانەکانی پێوە ببچڕین)!

ئەم هەواڵە تەزووی بە جەستەی "بەدیعوززەمان"دا هێنا و حەوانەوە و سرەوتی لێ بڕی و، بۆ هەموو کەسانی دەوروبەری خۆی بە ئاشکرا ڕاگەیاند کە:

(دەبێ بە بەڵگە بۆ هەموو جیهانی بچەسپێنم و پێیان بسەلمێنم کە قورئانی پیرۆز خۆرێکی مەعنەوی‌یە، تیشکی ئەو خۆرە هەرگیز کز نابێت و ڕووناکی‌یەکەشی بە هیچ کەسێك ناکوژێتەوە).

دوای ئەم ڕووداوە ڕۆشت بۆ ئەستەمبووڵ و پڕۆژەی دامەزراندنی زانکۆیەکی ئیسلامیی لە کوردستاندا بە ناوی "زانکۆی زەهراء" - بە وێنەی زانکۆی ئەزهەری پیرۆز -

پێشكەشی كاربەدەستان كرد، زانكۆیەك كە ئـەركی بلاوكردنـەوەی ڕاسـتی‌یەكانی ئیسـلام بگرێتە ئەستۆی و، زانستە ئایینی و زانسـتە گەردوونی‌یە نوێكانی پێكەوە تێدا بخوێنرێن، بەپێی نەخشە و بۆچوونی ئەو وتە بەناوبانگەی خۆی كە تیایدا دەڵێت:

(ڕووناكیی دڵ: زانستە ئایینی‌یەكانە و، نووری عەقڵیش: زانسـتە گەردوونی‌یـە نوێكانـە. بە تێكـەڵ كردنـی ئـەم دوانـە "ڕاسـتی" دەردەكـەوێت و، بـە لێـك جیابوونەوەشیان، لـەمیاندا فڕوفێڵ و گومان و، لەویشیاندا دەمارگیریی بێ‌كەڵك و نەفرەت لێكراو، سەر هەڵدەدات)!

لـەم هەوڵـەی ئـەم جـارەی‌دا و لـە هـەوڵێكی تریشـدا كـە لـە ساڵی ١٩٠٧زدا بـۆ هـەمان مەبەسـت ڕۆشت بۆ ئەستەمبووڵ و هـەوڵ و تـەقالای خـۆی خسـتەكار، هیـچ سـەركەوتنێكی بەدەسـت نـەهێنا، بـەڵام لـە سـاڵی ١٩١١زدا توانیـی قەناعـەت بـە سـوڵتان ڕەشـاد بكـات و، سوڵتانیش بڕێـك پـارەی بـۆ ئـەو پڕۆژەیـە تـەرخان كـرد و، لەسـەر لێـواری "دەریاچـەی وان" دەسـت كـرا بـە بنیاتنـانی ئـەو زانكۆیـە، بـەڵام هەڵگیرسـانی یەكـەم جـەنگی جیـهانی پـەكی تەواوكردنی پڕۆژەكەی خست.

* هەر لە ساڵی ١٩١١زدا سـەردانی وڵاتی "شـام"ی كـرد و، لەسـەر مینبـەری مزگـەوتی ئەمەوی لە دیمەشق وتارێكی گرنگی بە زمانی عەرەبی ئاراسـتەی زانایانی ئـەو وڵاتـە كـرد كـە دوایی بە ناونیشانی "الخطبة الشامية" (واتە وتاری شام) چـەند جـارێك چـاپ كـرا و، پاشـان هەر خۆی بە درێژە پێدانەوە وەری گێڕا بـۆ زمـانی توركـی و ئـەم دەقـەی دواییـش سـەرلەنوێ چەندین جار كراوەتەوە بە عەرەبی و بۆ چەند زمانێكی تریش وەرگێڕراوە.

* هەرچەند ڕای مامۆستا سەعیدی نوورسی لە یەكـەمین جـەنگی جیـهانی‌دا لەگـەڵ ئـەوە نەبوو كە دەوڵەتی عوسمانی بـە جەنگـەوە بگلێـت، بـەڵام هـەر ئـەوەندەی بەشـداریی دەوڵـەتی عوسمانی لە جەنگدا ڕاگەیەنرا، یەكسەر خۆی و قوتابی‌یانی هاوبەشی‌یان لـەو جەنگـەدا كـرد دژی ڕوسیای قەیسـەری، كـە لـە بـەرەی قەفقاسـەوە هێرشـی بـۆ شـارە سـنووری‌یەكانی كوردستان دەبرد. فەرماندەی سوپایش سەركردەیی (هێزە یارمەتیدەرەكان)ی پـێ سـپارد كـە لە قوتابی‌یانی "نوورسی" و خۆبەخشەران پێكهاتبوون.

* "بەدیعوززەمان" و هێزەكەی لە چەندین جەنگی گرنگدا لە دژی ڕووسەكان بەشداریی ئازا و بەجەرگانەی جیهادیان كرد و، هێندە ئازایەتی و توانا و لێهاتنی لەو جەنگەدا نواند كـە سەرنجی فەرماندەی سوپا و تەنانەت چاودێرە بیانی‌یەكانیشی ڕاكێشابوو!

* كاتێك كە سوپای ڕووس بە ژمارەیەكی زۆر زیاتر لە سوپای بەرگری‌كەران ڕژانـە نـاو شاری بەدلیسەوە "بـەدیعوززەمان" و قوتابی‌یـانی بەرگری‌یـەكی مەردانـە و فیداكارانـەیان لـە

شارەکەیان دەکرد، تا لــە ئـەنجامدا بـە سـەختی پێکـرا و لـە هۆشـی خـۆی چـوو، ئنجـا ڕووسەکانیش لـە ١٩١٦/٣/٢زدا بـە برینداری "دیـل"یـان کـرد و بردیـان بـۆ بەندیخانـەی ئەفسەرە دیلەکان لە شاری "کۆستڕما"ی سیبیریا.

★ لە ماوەی "دیلی"دا بەردەوام وانەی ئیمانیی بە ئەفسـەرە دیلـەکانی هـاوڕێی دەوت، کە ژمارەیان نەوەد دانە بوو.

★ هەر لەو ماوەیەدا و لەبەر نواندنی هەڵوێستێکی بەجەرگانـەی ئەوی زانـا و موجـاهید و خاوەن عـیززەتی ئیسـلام و، هەڵنەسـانی لەبـەر سـەرکردەیەکی گـەورەی سوپای ڕووس کـە خـاڵی قەیسـەر و سـەرکردەی بـەرەی قـەفقاس بـوو، لـە پـەتی سێدارە و بەدەستهێنانی "پلـەی شـەهیدی" نزیك بووەوە، بـەڵام خـوای گـەورە لەبـەر ئـەوەی بۆ ئـەرکێکی گەلـێ گرنـگ و گەورەتر هەڵی گرتبوو، لەو تاقیکردنەوەیە بەسەری بەرزەوە هێنایـەدەر و لـە حوکمـی ئیعدام ڕزگاری کرد!

★ پاشـان بـە جۆرێکـی گەلـێ سەرسووڕهێنەر و نـاوازە و بـە چاودێری‌یـەکی ئاشـکرای پەروەردگار لە دیلی هەڵهات و، لە ڕێی (وارشۆ، ئەڵمانیا، ڤیەننا)وە گەڕایەوە وڵات.

★ کـە لـە بـەرواری ١٩١٨/٦/١٧زدا گەیشـتەوە ئەسـتەمبووڵ "مـەدالیای جـەنگ"ی خەڵات کرا و، لە لایەن خەلیفە و شێخولئیسلامی دەوڵـەتی عوسمـانی و سـەرکردەی گشتیی سـوپا و قوتابییـانی زانستە شـەرعی‌یەکانەوە پێشـوازی‌یەکی نـاوازە و ڕەنگینـی لـێ کـرا. هەروەها کاربەدەسـتان داوایان لـێ کـرد کـە هـەندێ کارمـەندیی بـەرز لـە دەوڵـەتدا بگرێتە ئەستۆی، بەڵام مامۆستا هیچیانی نەویست جگە لە ئەندامێتیی (دار الحكمة الإســـلامية) کە دەزگایەکی زانستیی ئەوتۆ بوو تەنها گەورە زانایانی تێدا دەکران بە ئەندام.

★ لە مـاوەی ئـەم ئەندامێتی‌یـەی‌دا زۆربـەی نووسـراوە عەرەبی‌یـەکانی خـۆی چـاپ کـرد، وەك: تەفسیرە بەنرخەکەی کە ناوی "إشارات الإعجاز في مظان الإيجـــاز"ە و لـە گـەرمـەی جـەنگدا داینـابوو (کـە ئێستا لـە بەشـی خوێندنـی دوکتـۆرای وانـەی "تەفسیر" لــە زانکـۆی ئەزهـەری پیرۆز بە دەرس دەخوێنرێت). هـەروەها بەو مووچەیەی کە لە لایەن ئـەم دەزگایـەوە وەری دەگـرت نامیلکەکانـی کۆمەڵە پـەیامی "المثنوي العربـــي النوري"ی لە چـاپ دا و بـە خۆڕاییی بەسەر موسڵماناندا دابەشی کردن!

★ ئنجا هـەر کـە شـاری ئەستەمبووڵ لـە بەرواری ١٩٢٠/٣/١٨زدا لـە لایـەن دوژمنـانی ئیسلام بە تایبەت ئینگلیزەوە داگیر کرا، مامۆستا سەعیدی نوورسی هەسـتی کرد کـە تیرێکـی گـەورە و جـەرگبڕ ئاراسـتەی جیهـانی ئیسـلامی کـراوە. لەبـەر ئـەوە، قـۆڵی لێبڕانی لـێ هـەڵکرد و نامیلکـەی "خطوات ســـتة"ی دانـا کـە زۆر بـە تونـدی هێرشـی تێدا کردبووە

سەر داگیرکەران و، هۆکارەکانی نائومێدیی تێدا پووچەڵ کردبووەوە کە زۆر کەس لەو ڕۆژگارەدا دووچاری بووبوون. ئەم نامیلکەیەشی چەند جارێك بە نهێنی لەناو ئەستەمبووڵی داگیرکراودا لە چاپ دا و بڵاوی کردەوە و، کاریگەرییەکی گەلێ گرنگی لە دڵ و دەروونی خەڵکی – لەو بارودۆخەدا – بەجێ هێشت.

* ئنجا لەبەر ناوبانگە فراوان و جیهادە بەردەوامەکەی، دوو جار لە لایەن سەرکردەکانی بزووتنەوەی ئازادیخوازەوە، بۆ شاری "ئەنقەرە" بانگێشت کرا. هەرچەند یەکسەر لەو کاتەدا بەدەم خواستەکەیانەوە نەڕۆشت، چونکە پێی وابوو نابێت لەو دەمانەدا سەنگەرەکانی پێشوو چۆڵ بکات، بەڵام دوایی لە ڕێی گەڕانەوەیدا بۆ "وان" سەری لێ دان. ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٢٢زدا ڕۆشت بۆ ئەوێ و لە لایەن گەورە پیاوانی دەوڵەتەوە لە ئیستگای شەمەندەفەر پێشوازیی لێ کرا. بەڵام هێندەی نەخایاند لەم کاربەدەستانەی "ئەنقەرە"ش نائومێد بوو، چونکە سەرنجی دا زۆربەیان فەرز و ئەرکە ئاینییەکانیان جێبەجێ ناکەن.. لەبەر ئەوە، وتارێکی ئاراستەی ئەنجومەنی پەرلەمان (مجلسِ مبعوثان) کرد، کە بەم دەستەواژەیەی خوارەوە سەرەتای وتارەکەی دارشتبوو:

(یا أیها المبعوثون! "إنکم لمبعوثون لیوم عظیم"...)!

هەر لەوێدا جارێکی تر پڕۆژەی دامەزراندنی زانکۆکەی شاری وانی پێشکەش کردن وخستیە پێش‌چاوی بەرپرسانی نوێ، ئەوانیش بەڵێنیان پێ دا کە بەدەم خواستەکەیەوە بڕۆن، بەڵام چەند بارودۆخێکی ڕامیاری ڕێی لە هێنانەدیی پڕۆژەکە گرت.

* لە ساڵی ١٩٢٣زدا "بەدیعوززەمان" لە ئەنقەرەوە گەڕایەوە بۆ کوردستان و ڕۆشت بۆ شاری (وان) و لەسەر چیای "ئەرەك"ی نزیکی شاردا ماوەی دوو ساڵی بە خواپەرستی و بیرکردنەوە و گۆشەگیری و دەرس وتنەوە بە قوتابییانی بردەسەر، کەچی هێشتا هەر لە پریشکی کارەسات و ڕووداوەکان ڕزگاری نەبوو، چونکە لە گەرمەی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیراندا، ئەمیش (وەك زانا و کەسایەتییەکی گەورەی کورد) لەگەڵ کەسانێکی تری زۆر لە بەرواری ١٩٢٥/٢/٢٥زدا، ڕەهەندە(نەفی)ی شاری "بوردوور" لە باشووری خۆرئاوای تورکیا کرا و، پاشان بە تەنها خۆی بۆ شارۆچکەیەکی دوور ڕەهەندە کرا کە ناوی "بارلا"یە و لە بەرواری ١٩٢٧/٣/١زدا گەیشتە ئەوێ.

* دوژمنانی "ئیمان" پێیان وابوو کە لە "بارلا"دا مامۆستا نوورسی لەناودەچێت و ناوی کوێر دەبێتەوە و لە بیری خەڵکی دەچێتەوە و ئەم کانییە بەخوڕەمەی زانست و ئیمان وشك دەکات..

بەڵام لەبەر ئەوەی خوای گەورە خاوەنی لوتف و سۆز و بەزەییە سەبارەت بە سەرجەم بەندەکان، بە تایبەت بەندە پاك و دڵسۆزەکانی، ئەوا نیازە چەپەڵەکەی ئەوانی پووچەڵ کردەوە و، ئەم بەندە زانا و پاکەی بە فەزڵ و بەخشایشی خۆی وەها چاودێری کرد کە لەسەر دەستی ئەودا "بارلا"ی کرد بە سەرچاوەی پەخشاندنی تیشکێکی گەورەی نووری قورئانی پیرۆز. چونکە مامۆستا نوورسی زۆربەی "پەیامەکانی نوور"ی لەوێ دانا و، ئنجا بە شێوەی دەستنووس لە سەرانسەری تورکیادا بڵاو بوونەوە! ئەوەبوو هەر کە مامۆستا نوورسی - بە درێژایی چارەکە سەدەیەك - لەم شارەوە بۆ ئەو شار ڕەهەندە دەکرا و لە زیندان و بەندیخانەکانی گەلێ پارێزگای تورکیادا دووچاری بەندی و گرتن دەبوو، خوای گەورە کەسانێکی دڵسۆزی بۆ نووسینەوە و لەبەرگرتنەوەی ئەم پەیامانە دەرەخساند و ئەم ڕێژنە بەپیت و بەرەکەتانەی ئیمانیان بڵاو دەکردەوە، تاکو گیانی نوستووی ئیمانیان لای ئیمانداران بێدار کردەوە و لەسەر چەندین ستوون و پایەی زانستی و مەنتیقی و، بە ڕەوانبێژییەکی بەرز، دامەزراند. بە چەشنێك کەسانی عەوام لێی تێدەگەن و مرۆڤانی تایبەتمەند و شارەزایش بەهرەمەندی تێشوو لێ وەرگرتنی دەبن.

* پاش ئەوەی هەشتساڵ و نیوی بە ڕەهەندەیی لە بارلادا بردە سەر، لە چەند جێگایەکی تری وەك شاری "ئیسپارتە" و "قەستەمۆنی" و شارۆچکەی "ئەمیرداغ"دا بە "ڕەهەندەیی" و "دەست بەسەری" و، لە شارەکانی: "ئەسکیشەهر و ئەفیوون و دەنیزلی"یشدا بە "بەندی" ژیانی بەسەر بردووە. کە ئەمانەش چارەکە سەدەیەك لە ژیانی پڕ لە ناسۆر و ئەشکەنجە و جیهادی مەعنەویی تەمەنی ئەم زانا پایەدارە دەگرنەوە.

* بەم جۆرە، مامۆستا نوورسی لە سەرەتای ڕۆشتنیەوە بۆ "بوردوور" (١٩٢٦) و پاشان بۆ "بارلا" (١٩٢٧) هەتا ساڵی ١٩٥٠ز لە نووسینی "پەیامەکانی نوور"دا بەردەوام بوو، تاکو لە (١٣٠) پەیام (کتێب و نامیلکە) تێپەڕیان کرد و، هەموویان لە ژێر ناونیشانی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور"دا کۆکرانەوە و، بریتین لە چەند کۆمەڵە پەیامێکی سەرەکی کە ئەمانەن:

١- (سۆزلەر) واتە "وتەکان"..
٢- (مەکتووبات) واتە "نامەکان"..
٣- (لەمعەلەر) واتە "بریسکەکان"..
٤- (شوعاعلەر) واتە "تیشکەکان"..
٥- (لاحیقەلەر) واتە "پاشبەندەکان"..

هەروەها كۆمەڵە پەیامەكانی تری جگـە لەمانـەش، كـە هـەر هـەموویان تـا سـاڵی ١٩٥٦ز رێـی چاپخانـەكانیان بـە سەربەستی بـۆ نەگیرایەبـەر، بـەڵام لـەم بـەروارەوە، بڕیـاری ئـازادیی لـەچاپدانیان دەركـرا و، مامۆسـتا نوورسـی خـۆی سـەرپەرشتیی لـەچاپدانی كـردن هـەتا هەموویانی بە چاپ گەیاند و، پێش ماڵئاوایی كردنی لـەم ژیـانی دنیایـە و بـە چـاودێریی خـۆی سەرجەمی پەیامەكانی لە چاپ دان.

★ **گرنگترین تایبەتكاریی** ئەم پەیامانە لەوەدایە كە: تەفسیرێكی خەستوخۆڵی ڕاستییەكانی قورئـانی پـیرۆزە و، بـە "مەوسووعەیەكی ئیمـانی"ی بایـەخدار دادەنرێـن و، بـەدەم خواسـتە ئیمانییەكانی خەڵكی سەردەمەوە دەڕۆن و، ئیمانی تەحقیقی لە دڵ و دەروون و بـیر و ژیریـی مرۆڤی هاوچەرخدا دادەمەزرێنن و، بینای كوفـر و ئیلحـاد لـە بنج و بێخـدا هەڵدەتـەكێنن و، قەڵای مەحكەمن بۆ ئیمانداران و، گرنگترین چەكی پێشكەوتووی "ئیمان"ن لەم سـەردەمەدا، كە نوێترین چەكی فرت و فێڵی كوفر و ئیلحادی تێدا بەكار دەهێنرێت!

★ لـە سـەعات سێ و نیـوی شـەوی قـەدری مـانگی ڕەمـەزانی پـیرۆزی سـاڵی ١٣٧٩ك بەرامبەر ١٩٦٠/٣/٢٣ز بەدەم بانگی پەروەردگاریەوە ڕۆشت و كۆچی ماڵئـاوایی لـەم دنیـا فانییە كـرد. خـوای گـەورە نوقمی میـهرەبانیی فراوانـی خـۆی بكـات و بـە بەهەشتی بـەرین شادی بكات. ئامین.

★ چـەند مـانگێك دوای كۆچـی دوایی، كاربەدەستان لـە گۆڕەكـەی دەریـان هێنـا و لـە شوێنێكی نەزانراودا ناشتیانەوە!

★ لـە دوای وەفـاتی خـۆی، قوتابییـە دڵسـۆزەكانی بەوپـەڕی چوسـت و چـالاكی "پەیامـەكانی نـوور"یـان بـە خـەڵكی گـەیاند و، بـە ئاستە زانستی و فیكرییـەكانی نـاوخۆ و جیهانیان ناساندن و گەورە بیریاران(مفكرین)ی ئیسلامی و جیهانییان پێ ئاشنا كردن.

★ تا ئێستا لە توركیادا پێنج كۆنگرەی جیهانی و دەیان كۆڕ و سیمیناری ناوخۆیی لەسەر ژیان و بیری مامۆستا نوورسی گـیراوە. هـەروەك لـە چـەندین شـوێنی تـری جیـهاندا چەشنی: (میسر و مەغریب و ئـەردەن و مالیزیـا و ئوسـترالیا و ئەندۆنیسیا و یەمـەن و چـاد) كۆنگـرەی جیـهانی و كـۆڕ و سـیمیناری زانستیی لـە ئاستە ئەكادیمییـەكاندا لەسـەر پێشـكەش كـراوە. جگـە لەو دەیان لێكـۆڵینەوە و باس و كتێبانـەی كـە بـە زمـانە جیـا جیاكـان بـۆ ئـەم مەبەسـتە نـووسـراون و، جگـە لـەو نامـە زانكـۆیی و ئەكادیمیانـەش كـە بـۆ وەرگرتنـی بڕوانامـەی بـالاّ (ماستەر و دكتۆرا) لـە چـەندەها زانكـۆی نـاوخۆ و جیـهانیدا (هـەر لـە مالیزیـاوە تـا دەگاتـە فەرەنسا) لەسەر ژیانی "نوورسی" خۆی و لەسەر پەیامەكانی نووسراون و ئامادە كراون.

★ کەسانی دیار و بەناوبانگی گۆڕەپانی زانست و فیکری ئیسلامیی سەردەم چ لـە ئاستی کوردستان و چ لە ئاستی عێراق و وڵاتە عەرەبی و ئیسلامی‌یەکان و چ لە ئاستی جیـهاندا لـە پێشەنگی توێژەر و نووسەر و لێکۆڵەرانی ژیان و نووسینەکانی مامۆستا "نوورسی"دان، کە لێرەدا بۆ نموونە تەنها ناوی هەندێکیان پێش‌چاو دەخەین، وەك:

(د. موحسین عەبدولحەمید ، د. محەمەد سەعید ڕەمەزان بۆتانی، د. عەلی محێدین قەرەداغی، د. جەلال جەلالی زادە، عەبدولقادر بادللی، د. عیمادەدین خەلیل، خوا لێخۆشبوو مامۆستا ئەبولحەسەن نەدەوی و، دەیان زانا و پرۆفیسۆری تر لە زانکۆی ئەزهەر و زۆربەی زانکۆکانی جیهانی ئیسلامی و تەنانەت خۆرهەڵاتناسانی چەند زانکۆیەکی خۆرئاوایش) خوێنەری بەڕێز بۆ خۆی دەتوانێت لە سەرچاوەکان و لە ڕێی ئەو کتێب و باس و بابەتانەش کە لە بارەی بیر و زانست و ژیانی مامۆستا نوورسی‌یەوە پێشکەش کراون، بە نووسینەکانی ئەو زانا و بیریارانە و کەسانی تریش ئاشنا ببێت.

★ کاری وەرگێڕانی "پەیامەکانی نوور" بۆ زمانەکانی تری جیهان هەر بەردەوامە. ئەوەتا – سوپاس بۆ خوا – وەرگێڕانی سەرجەمی پەیامەکان بۆ (زمانی عەرەبی) لـە لایەن مامۆستا (ئیحسان قاسم صالحی)یەوە تەواو بووە و، لە دە دانە بەرگی قەشەنگ و ڕەنگیندا و لە هەردوو شاری ئەستەمبووڵ و قاهیرە بڵاو کرانەوە. بەشێکی زۆریشیان لە لایەن خوشکی نۆموسڵمان: ماری وێلد(شوکران واحیدە)ەوە کراون بە ئینگلیزی و تا ئێستا پێنج بەرگی گەورەیان بە چاپی جوان و ڕەنگین بەو زمانە لێ بڵاو کراوەتەوە.

سوپاسی بێ‌کۆتایی بۆ خواوەندی میهرەبان کە یارمەتی و تەوفیقی نووسەری ئەم چەند دێڕەشی دا کە زیاتر لە سەد دانەمان لەو پەیامانە کرد بە کوردی و، تا ئێستا و لە ماوەی هەژدە ساڵدا زیاد لە (چل و پێنج) نامیلکە و پەیامان لەو وەرگێڕراوە کوردی‌یانە و لە دووتوێی (بیست و شەش) کتێبدا بڵاو کردەوە و، دەیان پەیامی تریش ئامادەی چاپن. وا ئێستاش لە نیازدایە کە – بە پشتیوانیی خوای گەورە – سەرجەمی ئەم وەرگێڕراوە کوردی‌یانە – وەکو تورکی و عەرەبی و ئینگلیزی‌یەکان – لە شێوەی بەرگی گەورەشدا بڵاو بکەینەوە.

بەشێکی ئەم پەیامانە بۆ ئەم زمانانەی خوارەوەش وەرگێڕراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە:

ئەڵمانی، فەرەنسی، ڕووسی، ئۆردی، فارسی، ئیتالی، کۆجاراتی، مەلایا، ڕۆمانی، چینی، بولگاری، پورتوگالی، ئەلبانی، بۆسنی، ئیسپانی، مەقەدۆنی... هەروەها گەلێ زمانی تریش.

★ لـه چـه‌ند زانكۆيـه‌كی جیـهاندا زانســت و بـیری "نوورســی" لــه نــاوه‌ندی مه‌نــهه‌جه ڕه‌سمی‌یه‌كان و سه‌رچاوه زانستی‌یه‌كاندا دانراون، وه‌ك زانكۆی ئه‌زهه‌ری میسـر و، زانكـۆی "محمد الخامس" له مه‌غریب و، زانكۆی ئیسلامیی جیهانی له مالیزیا.

★ هیوادارم گه‌لی كوردمان – به تایبه‌ت توێژی زانا و ڕۆشنبیران و خوێنه‌رانمان – پتر ئـاوڕ له‌م كه‌سایه‌تی‌یه گه‌وره‌یه‌ی نه‌ته‌وه‌كه‌ی خۆیان بده‌نه‌وه و زیاتر به ژیـان و نووسینه‌كانی ئاشنا بن و، له‌م ڕووه‌وه ئێمه‌ش له گه‌لانی تر دوانه‌كه‌وین.

★ زۆر بـه دڵنیایی‌یـه‌وه ده‌ڵێـم: گـه‌وره پیـاوانی نه‌تـه‌وه‌كانی تـر هێنـده‌ی به‌شـێكی كـه‌می زانایی و گه‌وره‌یی مامۆستا نوورسی زیره‌كی و بلیمه‌تی و زانست و ئازایه‌تی و ئیمـانداری و دڵسۆزی‌یان نه‌نواندووه، كه‌چی نه‌ته‌وه‌كانیان له شان و باڵی ئه‌وانیان به‌رز كردووه‌تـه‌وه و بـه جیهانیان ناساندوون و لـه ئاسـتی جیهاندا شـانازی‌یان پێوه ده‌كه‌ن، به‌ڵام ئێمه هێشتا ئـاوڕی پێوستمان له‌م گه‌نجینه زێڕ و گه‌وهه‌رانه‌ی خۆمان نه‌داوه‌ته‌وه. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شـدا زۆر هیـوادارم كه ڕۆژگارانی ئاینده به زیادبوونی سه‌ربه‌ستیی فیكری و به‌رز بوونه‌وه‌ی ئاسـتی ڕۆشـنبیری و زانستی لای هـه‌موو توێـژ و چینـه‌كانی گه‌له‌كه‌مان، پـتر نـرخ و بـه‌های به‌خششــه فیكـری و زانستی و ئیمانی‌یه‌كانی ئه‌م كه‌ڵه زانایه‌ی نه‌ته‌وه‌كه‌مان ده‌رده‌كه‌وێت و، سوودی زیاتری لـێ وه‌رده‌گیرێت.

★ له خوای گه‌وره داواكارم كـه هـه‌روه‌ك تـا ئێستا ئـاوڕی لوتـف و كـه‌ره‌می خـۆی لـێ داوینه‌ته‌وه، له‌مه‌ولاش هه‌ر به هه‌مان جۆر، به‌ڵكو زیاتریش، ڕووی سۆز و میهره‌بانیی خۆیمـان ئاراسته بكـات و لـه بڵاوكــردنه‌وه‌ی ســه‌رجه‌می په‌یامـه‌كانی نـووردا بـه زمـانی كـوردی پشـتیوانمان بێت و، نیـازی خـاوێن و گیرابـوونی لای خـۆیمان پێ ببـه‌خشێت و، لـه خـۆم و دایك و باوكم و خێزان و منداڵ و خوشك و برایانم و هه‌ركه‌سێك لـه‌م خزمه‌تـه پیرۆزه‌دا هـه‌ر یارمه‌تی‌یه‌كم ده‌دات و له سه‌رجه‌م موسڵمانان خۆش ببێت. ئامین.

إنّه على ما يشاء قدير وبالإجابة جدير.

فاروق رسول يحيــى

## چەند وشەیەك لە كۆتایی ئەم كتێبەدا:

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿هذا مِنْ فَضْلِ رَبّــي لِيَبْلُوَنــي أأشْكُرُ أمْ أكْفُر﴾ (النمل: ٤٠)

الحمد لله حمداً يوافي نعمه ويكافئ مزيده.. يا رب لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك وعظيم سلطانك.. سبحانك لا أحصي ثناء عليك أنت كما أثنيت على نفسك. عز جارك وجل ثناؤك.

جگە لە دەستی "كۆڵەواری" هیچ دەستێكی تر شك نابەم كە ڕووم بێت لە حوزووری خوای گەورەدا بەرزی بكەمەوە، لە زمانی "نەزانی" و "دەستەوسانی"ش زیاتر هیچ زمانێكی ترم نییە كە لە دەرگانەی ئەودا گۆ بكات هەتا پێی بلاڵێمەوە و سوپاسگوزاریی لوتف و كەرەمی بەردەوامی ئەو پەروەردگارە میهرەبانە بەسەر ئەم بەندە خەتاكار و گوناهبارەوە دەرببڕم و پێشكەشی ڕوانینی میهر و سۆزی بێ سنووری ئەوی بكەم.

بۆیە لەم ڕێیەوە و بە ئەندازەی هەموو خانە و گەردیلەكانی بوون و ژیانم، تەنانەت بە ژمارەی سەرانسەری گەردیلەكانی گەردوون، بەڵكو بە ئەندازەی نیعمەتە لەژمارە نەهاتووەكانی خواوەند، بگرە بە ژمارەی ئەو شتانەی كە لە زانستی خوای گەورەدان و بەو شێوەیەی كە خۆی پێی خۆشە: شوكر و سوپاسی خاوێن و شایان پێشكەش بە خواوەندی میهرەبانم دەكەم كە دوای بیست و چوار ساڵ كاری وەرگێڕان لە پەیامەكانی نووردا پشتی گرتین و یەكەم بەرگی "سەرجەمی پەیامەكانی نوور"مان خستە بەردەستی موسڵمانانی كورد زمانەوە، بەو هیوایەی كە چاودێری و پشتگیریی خواوەندمان هەر لە پشت بێت و بەرگەكانی تریشی بە دوادا بێن و بخرێنە بەر دەست و دیدی خوێنەرانی دڵسۆز و بەڕێزەوە.

لێرەدا پێم خۆشە كە لە ناخی دڵمەوە و لە دوای مامەڵەی ئەم ماوە درێژخایەنەم لەگەڵ پەیامەكانی نووردا، ئەو ڕاستییە بە خوێنەرانی بەڕێز ڕابگەیەنم كە: ئەم پەیامانە بۆ هەموو چینێكی كۆمەڵی مرۆڤایەتی پێویستن؛ هیچ كەس و كۆمەڵ و توێژێك نییە كە سوود و بەهرەی بەرز و گرنگ لەم پەیامانە وەرنەگرن..

ئەوەتا – بۆ نموونە – ئەو كەسەی بێ بڕوایە و پێیشی وایە كە بێبڕواییەكەی لەسەر بناغەی زانست و تێگەیشتنەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەم پەیامانە لە ڕوانگەیەكی خاوێن و

دڵسۆزانەوە پێی دەسەلمێنن کە ئەو بەڕێزە لەمەدا نیشانەکەی نەپێکاوە. بۆیە دەستی سۆز و خۆشەویستیی مرۆڤانەی بۆ درێژ دەکەن و ڕێی بیرکردنەوەی بەرزی پیشان دەدەن و تێی دەگەیەنن کە چ جۆرە بیرکردنەوەیەك شایانی ئەوی مرۆڤی خاوەن ڕێز و میوانی ئازیزی ناو کۆشکی گەردوونە و، نیگای بیرکردنەوەی هێندە بەرز و فراوان دەکەن کە هەر بۆ خۆی لە ڕێی بەراوردێکی بچووکەوە لە نێوان بیر و تێڕوانینی پێشووی و ئەم ئاسۆ فراوانەی بیرکردنەوەی نوێی‌دا پەی بە جیاوازی و مەودای نێوان هەردوو بیر و بۆچوونەکانی دەبات و "ڕاستی" بە ڕوونی و درەخشانی لە پێش‌چاوی‌دا بەرجەستە دەبێت و ڕێگای بەختەوەریی هەمیشەیی لە بەردەمی خۆی‌دا بە کراوەیی دەبینێت. جا ئەگەر مرۆڤێکی بەختەوەر بێت ئەوا بینایی "دڵ" و ڕووناکیی "ژیری"ی خۆی بەسەر ملنەدان و سەرسەختیی "دەروون"ی‌دا زاڵ دەکات و ئەم ڕێنمایی‌یەی پەیامەکانی نوور لە کیس نادات و بۆ پێگەیاندن و تێگەیاندنی خۆی دەیقۆزێتەوە و بەهرەمەندیان دەبێت. چونکە بۆی دەردەکەوێت کە مەگەر لەم پەیامانەدا کە بۆ چارەسەریی گیروگرفتە ئیمانی و فیکری‌یەکانی مرۆڤی هاوچەرخ نووسراون، دەنا بە دەگمەن دەتوانێت چارەسەریی ئەو گیروگرفتانەی لە سەرچاوەکانی تر، بە تایبەت خۆرئاوایی‌یەکاندا، بدۆزێتەوە.

خۆ ئەو کەسانەش کە بێ ئامانجن لە ژیانی دنیادا و هیچ بایەخێك بە باس و بابەتە جیددی‌یەکانی ئیمان نادەن و لە لایەنی ماددیی ژیان زیاتر ئاوڕ لە دەستەبەر کردنی خواستە مەعنەوی‌یەکانی ناخی خۆیان نادەنەوە و چاویان لە ئاستی ئەو داخوازی‌یانەدا نووقاندووە و پێیان وایە ژیان بێ ئامانج و بەرباد و هەڕەمەکی‌یە، ئەو جۆرە کەسانە گەر هێندە مۆڵەت بە خۆیان بدەن کە نەختێ گوێ لە ڕاستی‌یەکانی ئەم پەیامانە ڕابگرن، ئەوا بە دڵنیایی‌یەوە بۆیان دەردەکەوێت کە تەنانەت هێندەی گەردیلەیەکیش کاری هەڕەمەکی و بێ مەبەست و بێ ئامانج لە سەرانسەری گەردووندا نی‌یە! دیارە ئەو کاتەش قایل نابن بەوەی کە لەم یاسا گەردوونی‌یە گشتی‌یە خۆیان کەنار بدەن و لە پەراوێزی ژیاندا بڕۆنە گۆشەی بێ ئامانجی‌یەوە! لێرەشدا پەیامەکان دێن و ئامانجی ژیان و ئەرکی ئەستۆیان پێ دەناسێنن.

ئەو کەسانەش کە خاوەنی ئیمان و باوەڕێکی بێ‌هێز و تین لێ بڕاون، ئەم پەیامانە تین و تەوژمێکی نوێ بە ئیمانەکەیان دەدەن و سەرلەنوێ لەسەر چەندین پایە و ستوونی زانستی و مەنتیقی بۆیان دادەمەزرێننەوە و، ڕاستی‌یە غەیبی و پەنهانەکانیشیان بە وێنەی ڕاستی‌یە بەرجەستە و بینراوەکان بۆ دەچەسپێنن و، ئنجا بە ڕۆڵی گرنگیان لەناو گەردوون و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی‌دا ئاشنایان دەکەن و، ئەرکی ڕاستەقینەی ژیانی خۆیان - چ ژن بن و چ

پیاو – پێ دەناسێنن. ئەو كاتەش وەك مرۆڤێكی خاوەن پلەی "جێنشینی سەر زەوی" لەناو كۆمەڵ و ژینگەی خۆیاندا ڕەفتار دەكەن و هەڵسو كەوت دەنوێنن.

ئەو ئیماندارانەش كە لە هەوڵی بەرەو پێدان و بەهێز كردنی ئایین و خزمەتكردنی ئیمانەكەیاندان – چ لە ناخی دڵ و دەروونەكاندا و چ لە ئاسۆكانی دەرەوەدا – پەیامەكانی نوور دەستی یارمەتی و بەرچاوڕۆشنی بۆ هەر یەكەیان درێژ دەكەن، هەر كەسە و بەپێی ئەو كار و ئەركەی خستوویەتیە ئەستۆیەوە:

ئەوەتا سەبارەت بەو كەسانەی كە لە بواری پاكـژ كردن و تەزكیەی دەروونـدا كـار دەكـەن و بۆ بەدەستهێنانی پایە بەرزەكانی "ئیسلام" و "ئیمان" و "ئیحسان" تێدەكۆشـن، ئەم پەیامانە ڕێنمایی تایبەتی و پێویستیان دەخەنە بەردەست و، ڕێی دوورو درێژیان بۆ كـورت دەكـەنـەوە و، بەروبوومەكانی ئەو پلە بەرزانەیان پێ دەنۆشن و، لە پێ هەڵخلیسكان و مەترسییەكانی ڕێگاش ئاگاداریان دەكەنەوە!

ئەوانەشیان كە لە بواری تەبلیغ و پەروەردە و ڕاگەیاندنی ڕاستییەكانی ئایینی ئیسلامدا تێدەكۆشن، ئەم پەیامانە توێشوویەكی گەلێ پێویست و گرنگیان بۆ ئەم ڕێگا سەخت و درێژخایەنە پێشكەش دەكەن، كە ئەزموونی سێ چارەكە سەدەی تەمەنی دانەرەكەیانە. جا ئەوانەی كە بە دڵسۆزی و ئیخلاسەوە بۆ ئەم ئەركە لێبڕاون و خۆیان لە دەردی كوشندەی "لەخۆ ڕازی بوون" دەپارێزن و نایانەوێت هۆكارەكانی خزمەتیان لە لا ببێت بە خودی ئامانج و مەبەستەكان، ئەوانە بچووكترین ڕێنمایی لەم بوارەدا دەقۆزنەوە و سوودی لێ وەردەگرن، چ جای ئامۆژگارییەكانی ڕابەرێكی خاوەن ئەزموونی دووردرێژی وەك ئەم زانا پایەدارەی كە ڕێنماییەكانی خۆی لەم پەیامانەدا بۆ گەلاڵە كردوون!

خۆ ئەوانەش كە بەپێی پێوستیی ڕووبەڕوو بوونەوەكانی ڕۆژگار بایەخ بە ئەنجامدانی فەرزی جیهادی ماددی یان مەعنەوی دەدەن و، پیلانەكانی دوژمنان پووچەڵ دەكەنەوە كە بۆ گەلانی موسڵمان داڕێژراون، ئەوانە گەلێ توێشووی بەنرخ و ئەزموونی گرنگ لە هەردوو جۆرە جیهادەكەی دانەری ئەم پەیامانە وەردەگرن، چ ئەو جیهادە ماددییەی كە بەرامبەر بە دوژمنانی دەرەكی و كافرانی ڕووس لە جەنگی جیهانیدا بەوپەڕی لێهاتن و شایستەیی ئەنجامی دا و، چ ئەو جیهادە مەعنەوییەش كە لە ناوخۆدا و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو جەنگە مەعنەوییەی كە لە جیهانی "باوەڕ" و "هزر" و "ئەندێشە" و "ڕەوشت"ەكاندا موسڵمانانی پێوە گیرۆدە كرابوون، ڕۆشتە ناو مەیدانی نەبەرد و توانیی لەم جیهادەدا ڕاستی و مەزنیی ئیسلام و پووچەڵیی بیر و ڕا و ڕەوشتە سەپێنراوەكان بە بەڵگەی زانستی و ژیرەكی بچەسپێنێت.

ئەوانەش كە دەیانەوێت لەسەر ڕێ و ڕەفتاری پیاوچاكانی پێشین بڕۆن و بە ڕچە و شوێن پێكانی ئەواندا هەنگاو بنێن و، لەم كارەشدا هەڵسوكەوتەكانیان ڕاستەوخۆ لە ناخی خۆیانەوە و بە ڕابەریی قورئان و سوننەت و بە پێشەوایەتیی زانایانی سەلەف هەڵدەقوڵێت و سەرچاوە دەگرێت، دڵنیام ئەو كەسانەی كە ڕەفتاریان بەم جۆرەیە و لە پلە و ئاستێكی بەرزی ئیخلاس و تێگەیشتن و بیركردنەوەدان، نموونەیەكی هاوچەرخی بەرجەستە و خاوێن لەم پەیامانە و دانەرەكەیاندا بۆ خۆیان دەبیننەوە.

ئەو زانایانەش كە خوای گەورە بەشێكی لە زانستە ئیسلامی‌یەكان بە هەریەكەیان بەخشیوە، كاتێ بەهرەمەندی سوود لێ وەرگرتنی ئەم پەیامانە دەبن، نموونەی زانایەكی پایەبەرزی هاوچەرخ لە پێش‌چاوی خۆیاندا دەبیننەوە كە وێڕای بەهرە و پلە و پایە زانستی‌یە بەرزەكانیشی، كە دەیتوانی وەك داوێك بۆ ڕاوكردنی دەستكەوتەكانی دنیا بەكاری بهێنانایە، كەچی هەموو بەهرە و زانستەكانی لە ڕێ و شوێنی شەرعیی خۆیاندا و بۆ خزمەتی موسڵمانان و ئایینی ئیسلام بەكار هێنا و، هیچ جۆرە "پێویستی"و "ناچاری" و "هەوڵێكی لەخشتەبەر" نەیانتوانی لەو ڕاستە شەقامە بیترازێنن و بیكەن بە خزمەتگوزاری ئامانجەكانی دنیایی‌یە خۆپەرستەكان. بەڵكو بە پێچەوانەوە: هەموو زانیاری و بەهرە و زیرەكی و بیر و خەم و پەژارەیەكی خۆی لە خزمەتی بێگەردی ئایین و چارەسەریی كێشەكانی موسڵماناندا بەكار دەهێنا و، تەنانەت گەر پێویستی بكردایە لەو پێناوەدا - بە وێنەی زانایانی پێشین - وازی لە حەز و خواستە ڕەواكانی خۆیشی دەهێنا!

ئەو ڕۆشنبیرانەش كە هەوای مۆدێرنیست و عەقلانییەت لە دەماخی داون و پێیان باشە كە پێوەرە ژیرەكی‌یەكانی خۆرئاوای سەردەم بۆ هەڵسەنگاندنی هەموو شتێك بەكار بهێنن، پەیامەكان بە هەنگاونانی عەمەلی چەنا پێوەرێكی گەلێ باشتریان پێ دەناسێنن، كە لە خودی ئیسلام خۆیەوە سەرچاوە دەگرن و، سەربەخۆیی و ڕەسانەیەتیی زات بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەكەن و، هەڵگری ئەو جۆرە بۆچوونانە لە پاشكۆیی كەسان و قوتابخانە كاتی و نامۆكان دەپارێزن.

سەبارەت بە ئەدەبی ئیمان و سەرچاوەكانی ئیلهام وەرگرتنی ئەدیبانی ئیمانیشەوە، ئەوا ئەم پەیامانە چەند هێڵێكی گرنگ و سەرەكی‌یان داڕشتووە كە لە ڕاستی‌دا چوارچێوەی كار و بەردی بناغە و بینایی و بەسیرەتن بۆ ئەو ئەدیبانەی كە ئەم جۆرە ئەدەبە خولیای ئەندێشەیانە.

خۆی لە بڕوای زانست و تێڕوانینی ئیمانییشەوە بۆ زانستەكان و ڕۆڵی كاریگەریان لە دامەزراندن و بەهێز كردنی ئیماندا، ئەوا ئەم پەیامانە و دانەرەكەیان هەر لە كاتێكی دێرینەوە یەكەم پێشڕەوی ڕچەشكێن بوون لەم بوارەدا و هەوڵی دامەزراندنی زانكۆ و قوتابخانەیان بۆ بەرجەستە كردنی ئەم لایەنە داوە. بۆیە تاسەمەندانی ئەم لایەنەش بەهرەمەندی توێشووی گرنگ دەبن لەم پەیامانە.

ئنجا هەموو ئەم دەرەنجامانەی كە لەم دێڕانەی پێشوودا سەبارەت بە ئیمانداران و ڕۆڵی پەیامەكانەوە بۆ هەریەك لەوان پێش چاو خران، لە حاڵێكدایە كە هەر یەكەیان پتر بە خزمەتكردنی لایەنێكی ئیسلامەوە سەرقاڵ بن. بەڵام گەر كەسانێكی هێندە هیممەتبەرز و بەهرەوەر هەبن كە شموولییەت و هەمەلایەنگیریی ئەم ئایینەیان سەبارەت بە هەموو ئەو بوارانە ڕەچاو كردبێت، ئەوا جوانتر لە ڕێنماییە هەمە چەشنەكانی ئەم پەیامانە بەهرەمەند دەبن و، لە كۆكردنەوەی سەرجەم لایەنەكانی ئیسلام لە كار و ژیان و خزمەتەكانیاندا – پشت بە خوا – زیاتر سەركەوتوو دەبن.

مەرجی سەرەكیی گەیشتن بەم دەرەنجامانەی كە باسكران تەنها: خوێندنەوەی ورد و لەسەرخۆیە و، ئنجا بەكارهێنانی ویژدانیشە لە تاوتوێ كردن و هەڵسەنگاندن و دەركردنی بڕیارەكاندا!

* * *

پێش ئەوەی كۆتایی بەم چەند وشانە بهێنم، بە واجبی وەفاداریی ئەستۆی خۆمی دەزانم كە بەوپەڕی پێزانین و ئەمەكدارییەوە ڕۆڵی ئەو خوشك و برا بەڕێزانە باس بكەم كە لە پاكنووس و بڵاوكردنەوە و كارەكانی تری وەرگێڕانی پەیامەكانی نووردا بە زمانی كوردی، بە تایبەت لە ئامادەكردنی ئەم بەرگانەی سەرجەمی پەیامەكاندا، بە گەلێ شێوەی یارمەتیدان، بە دەنگمەوە هاتن و، جێ دەستی دیار و نیازی ڕەنگینیان لە پێش چاوی خواوەندی گەورە و مەلائیكەتانیدا نەخشاند.

هەندێك لەو بەڕێزانە لە چەند پەیامێكدا و هەندێكی تریشیان بە بەردەوامی لە یارمەتی و كاری پێویستدا بەوپەڕی ئیستیقامەت و ئیخلاسەوە درێغییان نەنواند، بە ڕادەیەك كە من وەرگێڕانی گەلێ پەیامی گرنگ و تەنانەت دەرچوونی ئەم بەرگانەی "سەرجەمی پەیامەكانی نوور"یش بە ڕێژنەی بەرەكەتی ئیخلاس و بەرهەمی نیازخاوێنیی ئەوانی دەزانم! چونكە ئەو دڵسۆزانە جگە لە گواستنەوەی واتاكان لە قاڵبی وشە و دەستەواژە عەرەبییەكانەوە بۆ داڕشتنەوەیان بە زمانی كوردی، ئەركێكی گرنگی تری ئەوتۆیان بۆ ئەم هەژارە نەهێشتەوە!

هەر لەبەر ڕەچاوکردنی ڕۆڵ و یارمەتییەکانی ئەو بەڕێزانە بوو کە لە چاپکردنی ئەم بەرگانەدا یەکەم جار دوودڵ بووم لەوەی ناوی خۆم وەك وەرگێڕێك لەسەر کتێبەکان بنووسم، چونکە هەرچەندە ڕێژەی جێدەستی خۆمم لەچاو ماندووبوونی ئەواندا لێك دەدایەوە و، ئنجا پشتگیری و چاودێریی خواوەندیشم لەم کارەدا بە ئاشکرا دەبینی، گەلێ پێم ئەستەم بوو کە بە نووسینی ناوم لەسەر کتێبەکان خۆم بە وەرگێڕیان دابنێم.

بەڵام هەر کە لە لایەکی تریشەوە بیرم لە فەسادی ڕۆژگار و لە شەرم لادانی ئەوانە دەکردەوە کە بە ڕۆژی ڕۆشنا و بێ سڵ کردنەوە لە هیچ بەربەستێك (لە ئایین و یاسا و تەقوا) لە مەڵاسدان بۆ پەلاماردانی بەری ڕەنج و کۆششی دەیان ساڵەی ئەرك و ماندوو بوونی کەسانی تر و، وێڕای ئەمەش هێشتا لەم تالآن و بڕۆیەدا خۆیان بە خاوەن حەق لە قەڵەم دەدەن و، واتای ئەم ئایەتە پیرۆزەیان تێدا هاتووەتەدی کە دەفەرموێ: ﴿**يُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِما لَمْ يَفْعَلُوا**﴾ (آل عمران:١٨٨).. بەڵێ، کاتێ کە بیرم لەم دیاردەیە دەکردەوە، خۆمم بە یەکەم بەرپرسی شەرعی و یاسایی دەزانی لەبەردەم خوا و خەڵکی و شەرع و یاسادا سەبارەت بە ئاکام و بەری ئەو ڕەنج و تەقالایەی کە ساڵەهای ساڵی خایاندووە، لە هەر دەستدرێژییەك و، بڕیارم دا دەست لەو مافە شەرعی و یاساییەم هەڵنەگرم[1]..

دەنا بە هەموو قەناعەتێکم و لە ناخی دڵمەوە لەو یەقین و دڵنیاییەدام کە ئەگەر هەر چاکە و لایەنێکی ئیجابی و جوانی لەم وەرگێڕانەدا هەبێت تەنها هی خوای گەورەیە و فەزڵ و بەخششی ئەو پەروەردگارە میهرەبانەیە بە سەرمەوە و، هەرگیز مافی ئەوە بەخۆم ڕەوا نابینم کە شانازییان پێوە دەربڕم، بەڵکو دەبێ شوکرانەی خوای گەورەیان لەسەر پێشکەش بکەم..

ئنجا هەر لاری و ناتەواوی و لاوازی و بێ کەڵکییەکیش لەم کارەدا ببێت، بە دڵنیاییەوە دەزانم کە لە دەروونی بەدخواز(نەفسی ئەمّارە)ی منەوە سەرچاوەی گرتووە و، هەر تەنها من بەرپرسم لێی. وەك دەقی ئایەتی پیرۆزی: ﴿**ما أصابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللهِ وَما أصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ**﴾ (النساء:٧٩) ئەم دەرسەمان دادەدات.

---

(١) هەرچەندە من خاوەنی هەموو مافێکی شەرعی و یاسایی خۆمم و دەتوانم لەو چوارچێوانەدا کاردانەوەکانم دەربخەم، بەڵام مادەم ئەوەی کە ئەم ڕەفتارە نامۆ و دزێوانەم لە بەرامبەرەوە ئەنجام دەدات لە عامەی موسڵمانانە و، پێغەمبەری سەروەریشمان – دروودی خوای لەسەر بێت – دەفەرموێ: (الدين النصيحة) کە عەرزیان کرد: (لمن)؟ فەرمووی: (لله ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم).

لەبەر ئەم فەرموودەیە، من تەنها یەك دانە ئامۆژگاریی ئاراستە دەکەم و دەڵێم:

(**اتقِ الله** .. واز لەم کارە دزێوانە بهێنە).

جا ئەگەر بە تەنگی دواڕۆژی خۆیەوە بێت، سوود لەم ئامۆژگارییەم وەردەگرێت و، سەروزیادیەتی.

جا ئەگەر ناوهێنانی سەرجەمی ئەو خوشك و برا بەڕێزانەی كە دەستی خاوێنی یارمەتییان بۆ ئەم پەیامانە درێژ كردووە لێرەدا مەیسەر نەبێت، كە لێم ڕوونە هەر هەموویان بەو ناوهێنانە ڕازی نین، چونكە بە نیازی ناوهێنانی لای خوای گەورە ئەو خزمەتانەیان پێشكەش كردووە، ئەوا هەرگیز ناتوانم ڕۆڵی گەورەی ئەم بەڕێزانە لێرەدا باس نەكەم:

برای بەڕێزم مامۆستا (حسەین حەسەن كەریم) تا ئێستا دوو بەرگی سەرجەمی پەیامەكانی نووری(وتەكان و مەكتووبات) لەگەڵ وەرگێڕانە عەرەبییەكاندا بەراورد كردووە و، تێبینیی سوودبەخشی پێش چاو خستووە.

هەروەها برای بەڕێزیش كاك (عەبدولكەریم عەبدوڵڵا) هەر لە سەرەتای ساڵەكانی هەشتای زایینییەوە تا ئێستا بەراوردی وەرگێڕراوە كوردییەكان لەگەڵ دەقە توركییەكاندا دەكات و، ئاگادارمان دەكاتەوە لە هەر تێبینییەك كە پێویست بێت بۆ یەكاویەك دەرچوونی ئەم كوردییانە لەگەڵ دەقە ئەسڵییەكاندا. جا ئەم هەوڵەی بەڕێزیان وای لەم وەرگێڕانە كوردییانە كردووە كە وەكو ئەوە وابن ڕاستەوخۆ لە زمانی توركییەوە كرابن بە كوردی.

چەند برایەكی بەڕێزیش هەر یەكەیان لە ڕێكخستنی پیتەكانی پەیامێك یان چەند پەیامێكدا لەسەر كۆمپیووتەر بەشدارییان كردووە، وەك بەڕێزان: كاك هیوا حسەین و كاك ئوسەید ئیحسان و كاك ئەسكەندەری حاجی شێخ قادر و ئەحمەدی كوڕم. بەڵام ڕۆڵی سەرەكی و ماندووبوونی زۆر لەم ڕووەوە زیاتر بەر كاك هۆشیاری مام تۆفیق كەوت، كە بۆ ماوەی چەند ساڵێك ئەم ئەركەی لە ئەستۆ گرت.

نووسینەوەی وەرگێڕانی پەیامەكانیش لەم چەند ساڵەی دواییدا كاك شازاد خستیە ئەستۆی خەتە خۆش و جوانەكەی خۆیەوە كە تەنانەت هەندێ جار نەك هەر پاكنووسەكان بەڵكو ڕەشنووسەكانیشی دەنووسییەوە! جگە لەوەی كە یارمەتیی كاك هۆشیاریشی دەدا.

كاك شێخ خالید بەرزنجیش، وێڕای بەراوردكردنی هەندێ پەیام لەگەڵ دەقە عەرەبییەكاندا، چەندین جاریش بە وردی پراوەی ئەم پەیامانەی خوێندەوە و لە هەڵەگیری و پێشكەشكردنی تێبینییە وردەكانیدا جێدەستی دیار و نمایانە. هەر لەم كاری هەڵەگیری و پێداچوونەوەیەشدا بەڕێزانی تری وەك: كاك حامیدی مەلا حەسەن و جەمال محەمەد ئەمین و هۆشیار و شازاد حەمە سەعید بە وردی بەشدارییی بەردەوامیان لەگەڵ ناوبراودا كردووە و تێبینییە سوودبەخشەكانیان خستووەتە ڕوو.

لە پێش هەموو ئەو بەڕێزانەشەوە ناتوانم ڕۆڵی مامۆستای بەڕێزم "ئیحسان قاسم سالحی" فەرامۆش بكەم كە هەموو مافێكی شەرعی و یاسایی ئەم پەیامانەی پێ بەخشیم.

